الله

# تەفسیری
# ئاسان
## بۆتێگەیشتنی قورئان

نووسینی
بورهان محمدامین

پێداچوونەوەی لیژنەیەک

چاپی دووەم

سوورەتی (الفاتحة)

سُورَةُ الفَاتِحَةِ
مَكِّيَّة

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ ﴿١﴾ الْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ ﴿٢﴾ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ ﴿٣﴾ مَالِكِ يَوْمِ الدِّينِ ﴿٤﴾ إِيَّاكَ نَعْبُدُ وَإِيَّاكَ نَسْتَعِينُ ﴿٥﴾ اهْدِنَا الصِّرَاطَ الْمُسْتَقِيمَ ﴿٦﴾ صِرَاطَ الَّذِينَ أَنْعَمْتَ عَلَيْهِمْ غَيْرِ الْمَغْضُوبِ عَلَيْهِمْ وَلَا الضَّالِّينَ ﴿٧﴾

سَبْعُ آيَاتٍ

(١) بەناوی خوای بەخشندە و میهرەبان (بەناوی ئەو خوایەی کانگای رەحمەت و سۆزو بەزەییە).

(٢) سوپاس و ستایش هەر شایستەی خوایە و بۆ خوایە، کە خاوەن و پەروەردگاری هەموو جیهانیان و هەموو بوونەوەرە.

(٣) بەخشندەو دلۆڤانە، کانگای رەحمەت و میهرەبانیە (رەحمەتی لە دنیادا هەموو شتێکی گرتۆتەوە، بەلاّم لە قیامەتدا تەنها بۆ ئیماندارانە).

(٤) خاوەن و سەرداری رۆژی پاداشت و سزایە (پادشای رۆژی قیامەتە کە دادپەروەری رەهاو بێ سنووری تێدا بەرپا دەکات).

(٥) خوایە؛ تەنها هەر تۆ دەپەرستین و هەر لە تۆش داوای یارمەتی و پشتیوانی دەکەین (لە کاروباری دین و دنیاماندا، بەتایبەت لەو کاروبارانەدا بە تۆ نەبێت، بەکەسی تر لەبەندەکانت ناکرێت).

(٦) خوایە بەردەوام رێنموییمان بفەرموو بۆ ئەم رێبازی راست و دروستی ئیسلامە.

(٧) کە بەرنامە و رێبازی ئەوانەیە لە نازو نیعمەتی خۆت بەهرەوەرت کردوون، نەمانخەیتە سەر رێبازی ئەوانەی خەشم و قینیان لێگیراوە (بەهۆی ئەوەوە دەیزانن و لایانداوە)، هەروەها نەمانخەیتە سەر رێبازی ئەوانەش؛ کە سەرگەردان و گومڕان (بەهۆی لاساری و یاخی بوون و نەزانینیانەوە)[1]

[1] (لە فەرموودەیەکی قودسیدا خوای گەورە دەفەرموێت : من نوێژم لە نێوان خۆم و بەندەی خۆم، دابەش کردووە (مەبەستیشی فاتیحەیە کە بەشێکی سەرەکی نوێژە): کاتێک ئیماندار دەڵێت الحمد لله رب العالمين خوا دەفەرموێت: ئەوەتە بەندەم سوپاس و ستایشم دەکات، کاتێک دەڵێت: الرحمن الرحيم، خوا دەفەرموێت : ئەوەتا بەندەم ستایش و وەسفم دەکات، کاتێک دەڵێت : مالك يوم الدين، خوا دەفەرموێت : ئەوەتا بەندەم بە خاوەن دەسەلاّتم دەزانێت کاتێک دەڵێت: اياك نعبد و اياك نستعين، خوا دەفەرموێت: بەندەم راست دەکات ئەوەتا هەرمن دەپەرستێت و هەرمن بەپشتیوان دەزانێت، کاتێک ئایەتی ٦، ٧ دەخوێنێت، خوا دەفەرموێت: ئەوە بۆ بەندەم، هەرچی داواش بکات پێی دەبەخشم)، هەروەها لە فەرموودەیەکی راست و دروستی تردا هاتووە کە پێغەمبەر ﷺ بە گەورەترین و پیرۆزترین سوورەتی قورئان ناوزەدی فەرمووە.




## سوورەتی (البـــقرة)

### بەناوی خوای بەخشندە و میهرەبان

(١) چەند پیتێـک لـە سـەرەتای هـەندێ لـە سـوورەتەکانی قورئـاندا هـاتوون ژمارەیـان (١٤) پیتـە، نیـوەی کـۆی پیتـەکانی زمـانی عەرەبین، بۆ سەلماندنی (إعجاز) و مەزنی و گرنگی قورئان کە لە توانای هیچ کەسـدا نیـە بەو پیتانە کتێبێکی ئـاوا بـێ وێنـە دابنێـت، بەرادەیـەک هـەتا ئەگـەر هـەموو گـرۆی نادەمیزاد و پەری کۆببنەوە بۆ ئەو مەبەسـتە بێگومان ناتوانن، هـەروەها چـەندەها نـهێنی تریشی تێدایە، زاناکـان لـە هـەندێکی دواون، هەندێکیشیان وتوویانە: هەر خوا خۆی زانایـە بەنهێنی ئەو پیتانە.

(٢) ئەو قورئانە کتێبێکـە هیـچ گومـانێکی تێدا نیە، (کە لە لایەن خوای پـەروەردگارەوە رەوانە کراوە بە جبرەئیلدا بـۆ پێغەمبـەرﷺ) کە مایەی رێنموویی و سـەرچاوەی هیدایەتـە بۆ خواناسان و پارێزکاران (کـە ئەوانـەن فـەرزەکان جێبـەجێ دەکـەن و لـە حـەرام خۆیـان دەپـارێزن، لـە رووی بیروباوەڕو کردارو گوفتارەوە).

(٣) ئەوانـەی بـاوەڕ بـە نـەبینراوەکان دەهێنـن (وەک خـواو فریشـتە و ئەوانـەی خـوا باسـی کـردوون و ئێمـە نایانبینین)، هەروەها نوێژەکانیان بەچاکی ئەنجام دەدەن و لەو رزق و رۆزییە (حەڵاڵەی) پێمـان بەخشـیوون، دەبەخشن.

(٤) (لە هەمان کاتدا) ئەوانە باوەڕ دەهێنن بەو (پەیامەی) کە بۆ تـۆ (ئـەی محمـدﷺ) دابـەزێنراوە و بـەو پەیامانەش کە بۆ (پێغەمبەران) ی پێش تۆ دابەزێنراوە، دڵنیاش دەبن کە رۆژی دوایی پێش دێت و قیامـەت هەر بەرپا دەبێت.

(٥) ئـائەوانـە لـەسـەر شـا رێگەی هیدایـەتی پـەروەردگاریانن و هـەر ئـەوانیشن سـەرفراز و سـەرکەوتوو (ئەمانـە بنەمـا سەرەکیەکانی ئیمان و ئیسلامن).

إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ سَوَآءٌ عَلَيۡهِمۡ ءَأَنذَرۡتَهُمۡ أَمۡ لَمۡ تُنذِرۡهُمۡ
لَا يُؤۡمِنُونَ ﴿٦﴾ خَتَمَ ٱللَّهُ عَلَىٰ قُلُوبِهِمۡ وَعَلَىٰ سَمۡعِهِمۡۖ وَعَلَىٰٓ
أَبۡصَٰرِهِمۡ غِشَٰوَةٞۖ وَلَهُمۡ عَذَابٌ عَظِيمٞ ﴿٧﴾ وَمِنَ ٱلنَّاسِ
مَن يَقُولُ ءَامَنَّا بِٱللَّهِ وَبِٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِ وَمَا هُم بِمُؤۡمِنِينَ ﴿٨﴾
يُخَٰدِعُونَ ٱللَّهَ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَمَا يَخۡدَعُونَ إِلَّآ أَنفُسَهُمۡ
وَمَا يَشۡعُرُونَ ﴿٩﴾ فِي قُلُوبِهِم مَّرَضٞ فَزَادَهُمُ ٱللَّهُ مَرَضٗاۖ
وَلَهُمۡ عَذَابٌ أَلِيمُۢ بِمَا كَانُواْ يَكۡذِبُونَ ﴿١٠﴾ وَإِذَا قِيلَ لَهُمۡ
لَا تُفۡسِدُواْ فِي ٱلۡأَرۡضِ قَالُوٓاْ إِنَّمَا نَحۡنُ مُصۡلِحُونَ ﴿١١﴾
أَلَآ إِنَّهُمۡ هُمُ ٱلۡمُفۡسِدُونَ وَلَٰكِن لَّا يَشۡعُرُونَ ﴿١٢﴾ وَإِذَا قِيلَ
لَهُمۡ ءَامِنُواْ كَمَآ ءَامَنَ ٱلنَّاسُ قَالُوٓاْ أَنُؤۡمِنُ كَمَآ ءَامَنَ ٱلسُّفَهَآءُۗ
أَلَآ إِنَّهُمۡ هُمُ ٱلسُّفَهَآءُ وَلَٰكِن لَّا يَعۡلَمُونَ ﴿١٣﴾ وَإِذَا لَقُواْ
ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ قَالُوٓاْ ءَامَنَّا وَإِذَا خَلَوۡاْ إِلَىٰ شَيَٰطِينِهِمۡ قَالُوٓاْ إِنَّا
مَعَكُمۡ إِنَّمَا نَحۡنُ مُسۡتَهۡزِءُونَ ﴿١٤﴾ ٱللَّهُ يَسۡتَهۡزِئُ بِهِمۡ وَيَمُدُّهُمۡ
فِي طُغۡيَٰنِهِمۡ يَعۡمَهُونَ ﴿١٥﴾ أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ ٱشۡتَرَوُاْ ٱلضَّلَٰلَةَ
بِٱلۡهُدَىٰ فَمَا رَبِحَت تِّجَٰرَتُهُمۡ وَمَا كَانُواْ مُهۡتَدِينَ ﴿١٦﴾

(٦) بەراستی ئەوانەی کە بێ باوەڕ بوون ئاگاداریان بکەیت یان ئاگاداریان نەکەیت یەکسانە بۆیان، باوەڕ و ئیمان ناهێنن...

(٧) (چونکە) خوا مۆری ناوە بەسەر دڵ و گوێیاندا و پەردەی بەسەر چاویاندا هێناوە، (نە بیردەکەنەوە، نەئامادەن حەق ببیستن و راستییەکان نابینن)، هەر بۆیە سزایەکی سەخت چاوەڕێیانە (ئەمانەش دەستەیەکن لە بێ باوەڕان کە هەر خوا خۆی دەیانناسێت).

(٨) لەناو خەڵکیدا کەسانێک هەن کە دەڵێن: ئیمان و باوەڕمان بە خواو بە ڕۆژی قیامەت هێناوە (لە راستیدا ئەوانە درۆ دەکەن) ئەوانە هەمیشە باوەڕدار نین.

(٩) ئەوانە (بەخەیاڵی خۆیان وادەزانن) خوا و ئەو کەسانە دەخەڵەتێنن کە باوەڕداری راستەقینەن!! کەچی جگە لە خۆیان کەسیان پێ ناخەڵەتێت، بەڵام هەست ناکەن و فام ناکەنەوە و بیرناکەنەوە.

(١٠) ئەوانە لە دڵ و دەروونیاندا نەخۆشی بێ بلوەڕی و حەسوودی و کینە هەیە، خوایش (بەسەرخستنی حەق و ئیمانداران) ئەوەندەی تر دەردیان گران و کاریگەر دەکات و سزایەکی سەختیش (لە دنیا و قیامەتدا) چاوەڕێیانە بەهۆی درۆکردن و ( دژایەتییان بۆ ئیسلام ).

(١١) ئەوانە کاتێک پێیان دەوترێت تۆوی گوناهو تاوان و خراپەکاری مەچێنن لە زەویدا، دەڵێن؛ بەڕاستی ئێمە تەنها چاکسازی دەکەین!!

(١٢) ئاگادار بن، کە بەراستی هەر ئەوانە تۆوی خراپە دەچێنن، بەڵام (بەهۆی لووت بەرزی و دەردەدارییانەوە) هەستی پێ ناکەن و (خۆیانی لێ گێل دەکەن).

(١٣) کاتێک پێیان دەوترێت ئیمان و باوەر بهێنن وەکو ئەو هەموو خەڵکە (بێ فێڵ و راستگۆیانە) کە باوەڕیان هێناوە، دەڵێن: چۆن ئێمە وەکو ئەو خەڵکە کەم عەقڵ و گێلانە باوەڕ دەهێنین، (خەڵکینە) چاک بزانن و ئاگاداربن کە هەر ئەوانە خۆیان کەم عەقڵ و گێل و نەفامن، بەڵام بەخۆیان نازانن .

(١٤) کاتێکیش (دووڕووەکان) دەگەن بەوانەی باوەڕیان هێناوە دەڵێن: ئێمە ئیمانداریـن و باوەڕمان هێناوە!!، کەچی کاتێک بە تەنها دەمێننەوە لە لای شەیتانە گەورە و فێڵبازەکانیان دەڵێن: بەڕاستی ئێمە لەگەڵ ئێوەین، بێگومان ئێمە تەنها گاڵتەیان پێدەکەین و پێیان رادەبوێرین!!

(١٥) (بەڵام خەیاڵیان خاوە چونکە) خوا سزای گاڵتەجارییەکەیان لێدەسێنێت و (دەیانکاتە پەندو گاڵتەجار)، ئەوە جارێ بەرەڵای کردوون تا کوێرانە مل بنێن و درێژە بەگومڕایی خۆیان بدەن.

(١٦) ئەوانە گومڕاییان کڕی بەڕێنموویی و هیدایەت، بازرگانیەکەیان قازانجی نەکرد، سەرمایەکەشیان کە هیدایەتە لە دەستیانداو مایەپووچ بوون و وەرگری ڕێبازی هیدایەت نەبوون...

مَثَلُهُمۡ كَمَثَلِ ٱلَّذِي ٱسۡتَوۡقَدَ نَارٗا فَلَمَّآ أَضَآءَتۡ مَا حَوۡلَهُۥ ذَهَبَ ٱللَّهُ بِنُورِهِمۡ وَتَرَكَهُمۡ فِي ظُلُمَٰتٖ لَّا يُبۡصِرُونَ ﴿١٧﴾ صُمُّۢ بُكۡمٌ عُمۡيٞ فَهُمۡ لَا يَرۡجِعُونَ ﴿١٨﴾ أَوۡ كَصَيِّبٖ مِّنَ ٱلسَّمَآءِ فِيهِ ظُلُمَٰتٞ وَرَعۡدٞ وَبَرۡقٞ يَجۡعَلُونَ أَصَٰبِعَهُمۡ فِيٓ ءَاذَانِهِم مِّنَ ٱلصَّوَٰعِقِ حَذَرَ ٱلۡمَوۡتِۚ وَٱللَّهُ مُحِيطُۢ بِٱلۡكَٰفِرِينَ ﴿١٩﴾ يَكَادُ ٱلۡبَرۡقُ يَخۡطَفُ أَبۡصَٰرَهُمۡۖ كُلَّمَآ أَضَآءَ لَهُم مَّشَوۡاْ فِيهِ وَإِذَآ أَظۡلَمَ عَلَيۡهِمۡ قَامُواْۚ وَلَوۡ شَآءَ ٱللَّهُ لَذَهَبَ بِسَمۡعِهِمۡ وَأَبۡصَٰرِهِمۡۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٞ ﴿٢٠﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱعۡبُدُواْ رَبَّكُمُ ٱلَّذِي خَلَقَكُمۡ وَٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِكُمۡ لَعَلَّكُمۡ تَتَّقُونَ ﴿٢١﴾ ٱلَّذِي جَعَلَ لَكُمُ ٱلۡأَرۡضَ فِرَٰشٗا وَٱلسَّمَآءَ بِنَآءٗ وَأَنزَلَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءٗ فَأَخۡرَجَ بِهِۦ مِنَ ٱلثَّمَرَٰتِ رِزۡقٗا لَّكُمۡۖ فَلَا تَجۡعَلُواْ لِلَّهِ أَندَادٗا وَأَنتُمۡ تَعۡلَمُونَ ﴿٢٢﴾ وَإِن كُنتُمۡ فِي رَيۡبٖ مِّمَّا نَزَّلۡنَا عَلَىٰ عَبۡدِنَا فَأۡتُواْ بِسُورَةٖ مِّن مِّثۡلِهِۦ وَٱدۡعُواْ شُهَدَآءَكُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ إِن كُنتُمۡ صَٰدِقِينَ ﴿٢٣﴾ فَإِن لَّمۡ تَفۡعَلُواْ وَلَن تَفۡعَلُواْ فَٱتَّقُواْ ٱلنَّارَ ٱلَّتِي وَقُودُهَا ٱلنَّاسُ وَٱلۡحِجَارَةُۖ أُعِدَّتۡ لِلۡكَٰفِرِينَ ﴿٢٤﴾

(١٧) نموونە و وێنەی ئەوانە وەک کەسێک وایە: ئاگرێک دابگرسێنێت (بۆ سوودی خۆی و هاوڕێکانی) کەچی کاتێک هەڵگیرساو دەوروبەری خۆی رووناک کردەوە، خوا رووناکیەکەیان لێ بکوژێنێتەوە و لە چەندەها تاریکیدا جێیان بهێڵێت و هیچ تروسکاییەک نابینن و رێ دەرناکەن.

(١٨) ئەوانە کەڕو لاڵ و کوێرن (لە ئاستی حەق و راستیداو)، ناشگەڕێنەوە (بۆ سەر هیدایەت).

(١٩) یاخود وێنەیان وەک کەسانێک وایە بە دەست بارانێکی لێزمەوە گیریان خواردبێت، کە پەڵە هەوری تاریک و هەورە تریشقە و بروسکەی هەبێت، لە تاو دەنگی بروسکەکە پەنجەیان دەئاخنن بەگوێچکەیاندا لە ترسی مردن، خوایش گەمارۆی کافرانی داوە (بارانەکە قورئانە و بروسکەکان، ترسانەدنی دووڕووەکانە کە حەز بەبیستنی ناکەن).

(٢٠) خەریکە تیشکی بروسکەکە بینایی چاویان بەرێت، هەر کاتێک بەر پێیان رۆشن دەکاتەوە، دەڕۆن، هەر کە تیشکەکە نەماو تاریک بوو لێیان، (دەسڵەمێنەوە و) هەڵوێستە دەکەن، خۆ ئەگەر خوا بیویستایە بیستن و بینینیانی لەناو دەبرد، بەراستی خوا دەسەڵاتی بەسەر هەموو شتێکدا هەیە.

(٢١) ئەی خەڵکینە پەروەردگاری خۆتان بپەرستن، ئەو زاتەی کە ئێوە و پێشینانی ئێوەشی بەدی هێناوە، بۆ ئەوەی رێبازی خواناسی و تەقوا و پارێزکاری بگرنە بەر.

(٢٢) هەر ئەوزاتە زەوی کردووە بە فەرش و جێگای نیشتەجێ بوون و ژیان بۆتان، ئاسمانی وەکو سەقفێک بەسەرتانەوە راگیرکردووە، لە ئاسمانەوە ئاوی بۆ باراندوون، جا بەهۆیەوە جۆرەها بەرهەمی (درەخت و گژوگیای) بەدەرهێناوە تا ببێتە رزق و رۆزی بۆتان، کەواتە شەریک و هاوتا بۆ خوا بڕیار مەدەن، کە خۆشتان دەزانن پەرستراو دەبێت بەدیهێنەر بێت .

(٢٣) جا ئەگەر ئێوە لە دوو دڵیدان و گومانتان لەم (قورئانە پیرۆزە) هەیە کە دامانبەزاندووە بۆ بەندەی خۆمان محمد ﷺ ئەگەر بۆتان دەکرێت ئێوەش هەوڵ بدەن سوورەتێکی وەک ئەو بهێنن، هاوبەیمان و هاوکارەکانیشتان جگە لە خوا (بۆ ئەو مەبەستە) بانگ بکەن ئەگەر ئێوە راست دەکەن.

(٢٤) خۆ ئەگەر نەتانتوانی و هەرگیز نایشتوانن (کەواتە باوەڕبهێنن و) خۆتان بپارێزن لەو ئاگرەی: سووتەمەنیەکەی خەڵکی و بەردە، کە بۆ بێ باوەڕ و خوانەناسان ئامادە کراوە.

وَبَشِّرِ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ أَنَّ لَهُمۡ جَنَّٰتٖ تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُۖ كُلَّمَا رُزِقُواْ مِنۡهَا مِن ثَمَرَةٖ رِّزۡقٗا قَالُواْ هَٰذَا ٱلَّذِي رُزِقۡنَا مِن قَبۡلُۖ وَأُتُواْ بِهِۦ مُتَشَٰبِهٗاۖ وَلَهُمۡ فِيهَآ أَزۡوَٰجٞ مُّطَهَّرَةٞۖ وَهُمۡ فِيهَا خَٰلِدُونَ ﴿٢٥﴾ ۞إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَسۡتَحۡيِۦٓ أَن يَضۡرِبَ مَثَلٗا مَّا بَعُوضَةٗ فَمَا فَوۡقَهَاۚ فَأَمَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ فَيَعۡلَمُونَ أَنَّهُ ٱلۡحَقُّ مِن رَّبِّهِمۡۖ وَأَمَّا ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ فَيَقُولُونَ مَاذَآ أَرَادَ ٱللَّهُ بِهَٰذَا مَثَلٗاۘ يُضِلُّ بِهِۦ كَثِيرٗا وَيَهۡدِي بِهِۦ كَثِيرٗاۚ وَمَا يُضِلُّ بِهِۦٓ إِلَّا ٱلۡفَٰسِقِينَ ﴿٢٦﴾ ٱلَّذِينَ يَنقُضُونَ عَهۡدَ ٱللَّهِ مِنۢ بَعۡدِ مِيثَٰقِهِۦ وَيَقۡطَعُونَ مَآ أَمَرَ ٱللَّهُ بِهِۦٓ أَن يُوصَلَ وَيُفۡسِدُونَ فِي ٱلۡأَرۡضِۚ أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡخَٰسِرُونَ ﴿٢٧﴾ كَيۡفَ تَكۡفُرُونَ بِٱللَّهِ وَكُنتُمۡ أَمۡوَٰتٗا فَأَحۡيَٰكُمۡۖ ثُمَّ يُمِيتُكُمۡ ثُمَّ يُحۡيِيكُمۡ ثُمَّ إِلَيۡهِ تُرۡجَعُونَ ﴿٢٨﴾ هُوَ ٱلَّذِي خَلَقَ لَكُم مَّا فِي ٱلۡأَرۡضِ جَمِيعٗا ثُمَّ ٱسۡتَوَىٰٓ إِلَى ٱلسَّمَآءِ فَسَوَّىٰهُنَّ سَبۡعَ سَمَٰوَٰتٖۚ وَهُوَ بِكُلِّ شَيۡءٍ عَلِيمٞ ﴿٢٩﴾



(٢٥) (ئەی پێغەمبەرﷺ) مژدە بدە بەوانەی کە باوەڕیان هێناوە و کارو کردەوە چاکەکانیان ئەنجامداوە بەوەی باخەکانی بەهەشت کە چەندەها روبار بەژێردرەخت و بەناو باخەکانیدا دەڕوات، بەڕاستی بۆیان ئامادەیە، هەرکاتێک لە میوەو بەرهەمێکی ئەو باخانەیان بۆ دەهێنن، دەڵێن: ئێستا لەوەتان هێنا، تاوێک لەمەو پێش خواردمان، هەر دەیهێنن و لە یەکتریش دەچن، (لە ڕەنگ و ڕواڵەتدا، بەڵام لە تام و بۆندا زۆر جیاوازن)، هەروەها لەوێدا هاوسەرانی پاک و بێ‌گەردیان بۆ ئامادەکراوە (ئەو بەختەوەرانە) ژیانی هەمیشەیی و نەبڕاوە لەو بەهەشتەدا دەبەنە سەر.

(٢٦) بەڕاستی خوا باکی نیەو نەنگ نیە بەلایەوە هەر نموونەیەک بهێنێتەوە بە مێشوولەیەک، لەویش بچووکتر بێت یان گەورەتر، جا ئەوانەی ئیمان و باوەڕیان هێناوە، ئەوە چاک دەزانن ئەم نموونەیە ڕاستە و لە لایەن پەروەردگاریانەوەیە، ئەوانەش کافرو بێ باوەڕن دەڵێن: خوا مەبەستی چی بوو لەم نموونەیەدا؟ (خوای گەورەش دەفەرموێت) زۆرێکی پێ گومڕا دەکات و زۆرێکی تریشی پێ هیدایەت و ڕێنموویی دەکات، بەڵام دیارە جگە لە لارو وێرو یاخی و تاوانباران کەسی تر گومڕا ناکات...

(٢٧) ئەوانەی پەیمانی خوا (کە لە ڕووی فیترەت و سروشت و پەیامەکانی خواوە) هەیانە،(کە دەبێت خواناس بن) هەڵدەوەشێننەوە و پەیڕەوی ناکەن لە دوای بەهێزو پتەو بوونی، ئەو پەیوەندییانەش دەپسێنن کە خوا فەرمانی گەیاندنی داوە، لە زەویشدا تاوان و خراپە دەچێنن، ئا ئەوانە خۆیان زەرەرمەند و خەسارەتمەندن.

(٢٨) (خەڵکینە)، چۆن بێ‌بڕوا دەبن بەخوا لەکاتێکدا ئێوە بێ گیان بوون (لەتوێی خاکدا) خوا (دروستی کردوون) و گیانی بەبەردا کردن، پاشان دەتانمرێنێت و دوایی زیندووتان دەکاتەوە، ئەوسا هەر بۆ لای ئەویش دەبرێنەوە.

(٢٩) هەر ئەوزاتە هەموو شتێکی لە زەویدا بۆ ئێوە دروست کردووە، پاشان ویستی ئاسمان دروست بکات، بۆیە بە حەوت چین بەدی هێناو ڕێکی‌خستن، هەر خۆیشی بە هەموو شتێک زاناو ئاگادارە.

وَإِذْ قَالَ رَبُّكَ لِلْمَلَـٰٓئِكَةِ إِنِّى جَاعِلٌ فِى ٱلْأَرْضِ خَلِيفَةً قَالُوٓا۟ أَتَجْعَلُ فِيهَا مَن يُفْسِدُ فِيهَا وَيَسْفِكُ ٱلدِّمَآءَ وَنَحْنُ نُسَبِّحُ بِحَمْدِكَ وَنُقَدِّسُ لَكَ قَالَ إِنِّىٓ أَعْلَمُ مَا لَا تَعْلَمُونَ ﴿٣٠﴾ وَعَلَّمَ ءَادَمَ ٱلْأَسْمَآءَ كُلَّهَا ثُمَّ عَرَضَهُمْ عَلَى ٱلْمَلَـٰٓئِكَةِ فَقَالَ أَنۢبِـُٔونِى بِأَسْمَآءِ هَـٰٓؤُلَآءِ إِن كُنتُمْ صَـٰدِقِينَ ﴿٣١﴾ قَالُوا۟ سُبْحَـٰنَكَ لَا عِلْمَ لَنَآ إِلَّا مَا عَلَّمْتَنَآ إِنَّكَ أَنتَ ٱلْعَلِيمُ ٱلْحَكِيمُ ﴿٣٢﴾ قَالَ يَـٰٓـَٔادَمُ أَنۢبِئْهُم بِأَسْمَآئِهِمْ فَلَمَّآ أَنۢبَأَهُم بِأَسْمَآئِهِمْ قَالَ أَلَمْ أَقُل لَّكُمْ إِنِّىٓ أَعْلَمُ غَيْبَ ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَأَعْلَمُ مَا تُبْدُونَ وَمَا كُنتُمْ تَكْتُمُونَ ﴿٣٣﴾ وَإِذْ قُلْنَا لِلْمَلَـٰٓئِكَةِ ٱسْجُدُوا۟ لِـَٔادَمَ فَسَجَدُوٓا۟ إِلَّآ إِبْلِيسَ أَبَىٰ وَٱسْتَكْبَرَ وَكَانَ مِنَ ٱلْكَـٰفِرِينَ ﴿٣٤﴾ وَقُلْنَا يَـٰٓـَٔادَمُ ٱسْكُنْ أَنتَ وَزَوْجُكَ ٱلْجَنَّةَ وَكُلَا مِنْهَا رَغَدًا حَيْثُ شِئْتُمَا وَلَا تَقْرَبَا هَـٰذِهِ ٱلشَّجَرَةَ فَتَكُونَا مِنَ ٱلظَّـٰلِمِينَ ﴿٣٥﴾ فَأَزَلَّهُمَا ٱلشَّيْطَـٰنُ عَنْهَا فَأَخْرَجَهُمَا مِمَّا كَانَا فِيهِ وَقُلْنَا ٱهْبِطُوا۟ بَعْضُكُمْ لِبَعْضٍ عَدُوٌّ وَلَكُمْ فِى ٱلْأَرْضِ مُسْتَقَرٌّ وَمَتَـٰعٌ إِلَىٰ حِينٍ ﴿٣٦﴾ فَتَلَقَّىٰٓ ءَادَمُ مِن رَّبِّهِۦ كَلِمَـٰتٍ فَتَابَ عَلَيْهِ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلتَّوَّابُ ٱلرَّحِيمُ ﴿٣٧﴾

(٣٠) (ئەی محمد ﷺ باسی ئەوە بکە لە دێرین زەماندا) پەروەردگارت بە فریشتەکانی وت: بەڕاستی من دەمەوێت لە زەویدا جێنشینێک دابنێم (بۆ ئاوەدانی و دینداری)، فریشتەکان وتیان: ئایا کەسێکی تیادا دەکەیتە جێنشین کە خراپە و تاوانی تیادا بچێنێت و خوێنڕێژیی تیادا ئەنجام بدات؟! لەکاتێکدا ئێمە تەسبیحات و سوپاس و ستایشت دەکەین و قەدرو ڕێزی تۆ چاک دەزانین و بەدوورت دەگرین لەو شتانەی شایستەی تۆ نین، (لە وەڵامیاندا) خوا فەرمووی: بێگومان ئەوەی ئێوە نایزانن من دەیزانم.

(٣١) (ئینجا ئادەمی دروست کرد، ویستی توانایی و لێهاتوویی بۆ فریشتەکان روون بکاتەوە) ناوی هەرچی پێویستی دەوروبەر هەیە فێری کرد، لەوەودوا بە فریشتەکانی ڕانواند و پێی فەرموون: ئادەی ئێوە ناوی ئەو شتانەم پێ بڵێن ئەگەر ڕاست دەکەن و (توانای ئاوەدان کردنەوەی زەویتان هەیە؟).

(٣٢) فریشتەکان وتیان: پاکی و بێگەردی و ستایش هەر شایستەی تۆیە، ئێمە هیچ زانستێکمان نیە، تەنها ئەوە دەزانین کە تۆ فێرت کردووین، بەڕاستی تۆ پەروەردگارێکی زاناو دانایت.

(٣٣) ئەوسا خوا فەرمووی ئەی ئادەم، ئادەی تۆ ئاگاداریان بکە بە ناوەکانیان، جا کاتێک ئادەم هەواڵی ناوەکانی پێدان.. خوا فەرمووی: ئەی پێم نەوتن بەڕاستی من خۆم ئاگادارم بەنهێنی ئاسمانەکان و زەوی، دەشزانم ئێوە چی دەردەخەن و چی دەشارنەوە؟!

(٣٤) کاتێکیش بە فریشتەکانمان وت: سوژدە بەرن بۆ ئادەم (سوژدەی ڕێزو بەفەرمانی خوا، وەکو رووگەیەک) سوژدەیان برد، جگە ئیبلیس نەبێت کە سەرپێچی کردو خۆی بە گەورەزانی و خۆی خستە ریزی کافرەکانەوە.

(٣٥) ئینجا وتمان: ئەی ئادەم خۆت و هاوسەرت لەم بەهەشتەدا ژیان بەرنەسەرو نیشتەجێ بن لەهەر کوێ حەزدەکەن بخۆن و بخۆنەوە بەتێرو تەسەلی، بەڵام نزیکی ئەم درەختە مەکەون (درەختێکی دیاریکراو بۆ تاقیکردنەوە لێیان قەدەغە کرا) ئەگینا دەچنە ریزی ستەمکارانەوە.

(٣٦) شەیتان (فرسەتی لێهێنان) و لە خشتەی بردن (وای لێکردن لە بەرو بوومی درەختە قەدەغە کراوەکە بخۆن) و لەو شوێنە (خۆش و پڕ لە نازو نیعمەتە) بەدەرکردنی دان، ئەوسا پێمان وتن: (مادەم سەرپێچیتان کرد ئیتر لێرە جێتان نابێتەوە)، دەبێت دابەزنە خوارەوە بۆ سەر زەوی، جا (لەوێ) هەندێکتان دوژمنی هەندێکتانن (شەیتان دوژمنی ئێوەیە و بەردەوام هەوڵ دەدات دوژمنایەتی لە نێوانتاندا بەرپا بکات)، تاماوەیەکی دیاریکراو نیشتەجێ دەبن لە زەویداو لە نازو نیعمەتەکان سوود وەردەگرن و بەهرەوەر دەبن.

(٣٧) پاشان ئادەم لەلایەن پەروەردگارییەوە چەند وشەو نزایەکی وەرگرت (بە دڵ و بەکوڵ پارایەوە خوای میهرەبانیش) نزاکەی وەرگرت و لێی خۆش بوو، چونکە بەڕاستی تەنها ئەو، زاتێکی ئێجگار میهرەبان و تۆبە وەرگرە. (نزاکەش لە ئایەتی ٢٣ی سورەتی ئەعراف دا هاتووە).

قُلْنَا ٱهْبِطُوا۟ مِنْهَا جَمِيعًا ۖ فَإِمَّا يَأْتِيَنَّكُم مِّنِّى هُدًى فَمَن تَبِعَ هُدَاىَ فَلَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ ﴿٣٨﴾ وَٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ وَكَذَّبُوا۟ بِـَٔايَـٰتِنَآ أُو۟لَـٰٓئِكَ أَصْحَـٰبُ ٱلنَّارِ ۖ هُمْ فِيهَا خَـٰلِدُونَ ﴿٣٩﴾ يَـٰبَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ ٱذْكُرُوا۟ نِعْمَتِىَ ٱلَّتِىٓ أَنْعَمْتُ عَلَيْكُمْ وَأَوْفُوا۟ بِعَهْدِىٓ أُوفِ بِعَهْدِكُمْ وَإِيَّـٰىَ فَٱرْهَبُونِ ﴿٤٠﴾ وَءَامِنُوا۟ بِمَآ أَنزَلْتُ مُصَدِّقًا لِّمَا مَعَكُمْ وَلَا تَكُونُوٓا۟ أَوَّلَ كَافِرٍۭ بِهِۦ ۖ وَلَا تَشْتَرُوا۟ بِـَٔايَـٰتِى ثَمَنًا قَلِيلًا وَإِيَّـٰىَ فَٱتَّقُونِ ﴿٤١﴾ وَلَا تَلْبِسُوا۟ ٱلْحَقَّ بِٱلْبَـٰطِلِ وَتَكْتُمُوا۟ ٱلْحَقَّ وَأَنتُمْ تَعْلَمُونَ ﴿٤٢﴾ وَأَقِيمُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتُوا۟ ٱلزَّكَوٰةَ وَٱرْكَعُوا۟ مَعَ ٱلرَّٰكِعِينَ ﴿٤٣﴾ ۞ أَتَأْمُرُونَ ٱلنَّاسَ بِٱلْبِرِّ وَتَنسَوْنَ أَنفُسَكُمْ وَأَنتُمْ تَتْلُونَ ٱلْكِتَـٰبَ ۚ أَفَلَا تَعْقِلُونَ ﴿٤٤﴾ وَٱسْتَعِينُوا۟ بِٱلصَّبْرِ وَٱلصَّلَوٰةِ ۚ وَإِنَّهَا لَكَبِيرَةٌ إِلَّا عَلَى ٱلْخَـٰشِعِينَ ﴿٤٥﴾ ٱلَّذِينَ يَظُنُّونَ أَنَّهُم مُّلَـٰقُوا۟ رَبِّهِمْ وَأَنَّهُمْ إِلَيْهِ رَٰجِعُونَ ﴿٤٦﴾ يَـٰبَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ ٱذْكُرُوا۟ نِعْمَتِىَ ٱلَّتِىٓ أَنْعَمْتُ عَلَيْكُمْ وَأَنِّى فَضَّلْتُكُمْ عَلَى ٱلْعَـٰلَمِينَ ﴿٤٧﴾ وَٱتَّقُوا۟ يَوْمًا لَّا تَجْزِى نَفْسٌ عَن نَّفْسٍ شَيْـًٔا وَلَا يُقْبَلُ مِنْهَا شَفَـٰعَةٌ وَلَا يُؤْخَذُ مِنْهَا عَدْلٌ وَلَا هُمْ يُنصَرُونَ ﴿٤٨﴾



ئنجا وتمان: هەمووتان دەبێ دابەزن (بۆ سەر زەوی)جا ئەگەر هەرکاتێک لە لایەن منـەوە ڕێنومایییتان بۆهات، هەرکەس شوێن ڕێنوومـایی مـن بکـەوێت، ئـەوە نـە تـرس و بیمیـان لەسـەر دەبێت، نە غەمگین و دڵتەنگ دەبن.

ئەوانەش بێباوەڕ بـوون و باوەڕیـان بـە نایەتـەکانی ئێمـە نـەبوو، ئەوانـە نیشـتەجێی دۆزەخن و بۆ هەتا هەتایی تیایدا دەمێننەوە.

ئەی نـەوەی ئیسـرائیل (نـەوەی حـەزرەتی یەعقوب ﷺ) یادی نازو نیعمەتی مـن بکەنـەوە کە بەسەرتاندا ڕژاندومەو بەوەفاو بەئەمەک بن و پەیمانەکەم جێبەجێ بکەن (کە ئیمان و کردەوەی چاک و باوەڕکردنـە بەهـەموو پێغەمبـەران بـەبێ جیاوازی) ئەوسا منیش پـەیمانی خـۆم بـەجێ دەهێنم (کە جێنشین کردنتانـە لـە دنیـاداو، بەهەشتی بەرینە لە قیامـەتدا) باترس و پیمتـان تەنها لە من هەبێت (تا ناسوودەیی ڕەهاتـان پـێ ببەخشم)...

هەروەها ئیمان بـهێنن بـەو قورئانـەی کـە ناردومەتە خوارەوە کە پاڵپشتی پەیامەکـەی لای ئێوەیە (تەورات و ئینجیلی دەسـتکاری نـەکراو) مەبنـە یەکـەم بـێ بـڕوا پێـی (لـە جیـاتی یەکـەم باوەڕدار)و نایەتەکانم بەنرخێکی کەم مەگۆڕنـەوە (لە پێناوی بەدەستهێنانی هـەندێ مـەرامی کـەم نرخی دنیادا)، تەنها لە من بترسـن و خۆتـان لـە خەشمی من بپارێزن.

نەکەن ڕاستی و بـەتاڵ، حـەق و ناحـەق بـە یەکەوە بناڵێنن و حەق مەشارنەوە، درۆ دامەپۆشن بەڕاست، لەکاتێکدا خۆشتان حەق و ڕاستی دەزانن کامەیە.

نوێـژەکانتـان بـەچاکی ئـەنجام بـدەن بـەدروشـمـەکانیـەوەو زەکاتیـش بـدەن، لـەگـەڵ کڕنـووش بـەرانـدا کڕنـووش بـبـەن (بۆ پەروەردگارتان).

(کەی ئەوە ڕاستە) فەرمانی چاکە بەخەڵکی بدەن و خۆتـان فـەرامۆش بکـەن؟! لـەکاتێکدا خـۆ ئـێوە کتێبی خوا- تەورات - دەخوێننەوە، (دەزانن سزای گوفتاری بێ ڕەفتار چۆنە) جانایا ژیریتان ڕێتان لێناگرێت لەو هەڵوێستە ناشرینە؟!

(ئێوە هەوڵ بدەن) پشت ببەستن بە نارامگرتن و نوێژکردن (بۆ گەیشتن بەئامانج) بەڕاستی نوێـژ ئـەرکێکی گـەورەو گرانە، مەگەر لەسەر ئەو کەسانەی کە بەخۆشەویستی و سۆزەوە خواپەرستی ئەنجام دەدەن و (باوەڕی دامەزراویان هەیە)...

ئەوانەی دەزانن بێگومان بەدیداری پەروەردگاریان شاد دەبن و باوەڕی پتەویان هەیە کە بۆ لای ئەو دەگەڕێنەوە.

ئەی نەوەی ئیسرائیل: یادی نازو نیعمەتەکانم بکەنەوە کە ڕشتومە بەسەرتاندا بێگومـان مـن گرنگـی زۆرم پێـداون و نازونیعمەتی زۆرم پێبەخشیوون(لە خواردن وخواردنەوە لە موعجیزەی جۆراوجۆر، لە چارەسەرکردنی کێشـەکانیان، ...هتـد) من زیادە ڕێزی ئێوەم داوە بەسەر هەموو خەڵکیدا (ئەڵبەتە لەسەردەمی خۆیانداو ئەوانەی کە پابەندی ئاینی خوا بـوون، بـە تایبەتی پێغەمبەران و پیاوچاکان)...

خۆتان بپارێزن لە ڕۆژێک کە کەس فریـای کـەس ناکـەوێت و کـەس هیچـی لـە دەست نایـەت و تکاکـاریی کەسـیش وەرناگیرێت و بارمتە و گۆڕانکاری تیادا ئەنجام نادرێت و ئەو کەسانەی خوانەناسن یارمەتی نادرێن و سەرناخرێن.

وَإِذْ نَجَّيْنَاكُم مِّنْ آلِ فِرْعَوْنَ يَسُومُونَكُمْ سُوءَ الْعَذَابِ يُذَبِّحُونَ أَبْنَاءَكُمْ وَيَسْتَحْيُونَ نِسَاءَكُمْ ۚ وَفِي ذَٰلِكُم بَلَاءٌ مِّن رَّبِّكُمْ عَظِيمٌ ﴿٤٩﴾ وَإِذْ فَرَقْنَا بِكُمُ الْبَحْرَ فَأَنجَيْنَاكُمْ وَأَغْرَقْنَا آلَ فِرْعَوْنَ وَأَنتُمْ تَنظُرُونَ ﴿٥٠﴾ وَإِذْ وَاعَدْنَا مُوسَىٰ أَرْبَعِينَ لَيْلَةً ثُمَّ اتَّخَذْتُمُ الْعِجْلَ مِن بَعْدِهِ وَأَنتُمْ ظَالِمُونَ ﴿٥١﴾ ثُمَّ عَفَوْنَا عَنكُم مِّن بَعْدِ ذَٰلِكَ لَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ ﴿٥٢﴾ وَإِذْ آتَيْنَا مُوسَى الْكِتَابَ وَالْفُرْقَانَ لَعَلَّكُمْ تَهْتَدُونَ ﴿٥٣﴾ وَإِذْ قَالَ مُوسَىٰ لِقَوْمِهِ يَا قَوْمِ إِنَّكُمْ ظَلَمْتُمْ أَنفُسَكُم بِاتِّخَاذِكُمُ الْعِجْلَ فَتُوبُوا إِلَىٰ بَارِئِكُمْ فَاقْتُلُوا أَنفُسَكُمْ ذَٰلِكُمْ خَيْرٌ لَّكُمْ عِندَ بَارِئِكُمْ فَتَابَ عَلَيْكُمْ ۚ إِنَّهُ هُوَ التَّوَّابُ الرَّحِيمُ ﴿٥٤﴾ وَإِذْ قُلْتُمْ يَا مُوسَىٰ لَن نُّؤْمِنَ لَكَ حَتَّىٰ نَرَى اللَّهَ جَهْرَةً فَأَخَذَتْكُمُ الصَّاعِقَةُ وَأَنتُمْ تَنظُرُونَ ﴿٥٥﴾ ثُمَّ بَعَثْنَاكُم مِّن بَعْدِ مَوْتِكُمْ لَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ ﴿٥٦﴾ وَظَلَّلْنَا عَلَيْكُمُ الْغَمَامَ وَأَنزَلْنَا عَلَيْكُمُ الْمَنَّ وَالسَّلْوَىٰ ۖ كُلُوا مِن طَيِّبَاتِ مَا رَزَقْنَاكُمْ ۖ وَمَا ظَلَمُونَا وَلَٰكِن كَانُوا أَنفُسَهُمْ يَظْلِمُونَ ﴿٥٧﴾

(٤٩) بیری نیعمەتی رزگاربونیشتان بکەنەوە کاتێک رزگارمان کردن لە دەست دارو دەستەی فیرعەون کە خراپترین سزاو ئازاریان دەدان، کورەکانتانیان سەردەبڕین و ئافرەتەکانتانیان دەهێشتنەوە (بۆ کارەکەری وخزمەت) ئەوەش بۆ ئێوە توشهات و تاقیکردنەوەیەکی گەورە بوو بۆتان لەلایەن پەروەردگارتانەوە (تا پشت بەو زاتە ببەستن و بڕوای تەواوتان پێی هەبێت).

(٥٠) یادی ئەو نیعمەتە بکەنەوە کە لەبەر خاتری ئێوە دەریاکەمان لەت کرد، ئینجا رزگارمان کردن، دارو دەستەی فیرعەونمان نوغرۆ کرد، لەکاتێکدا ئێوە بەچاوی خۆتان بینیتان و تەماشاتان دەکردن.

(٥١) یادی ئەو(نیعمەتە) بکەنەوە کاتێک چل شەو وادەمان دانا بۆ موسا (بۆ پاڕانەوەو نزا) پاشان گوێرەکەکەتان کردە خواتان، بێگومان ئێوە ستەمکار بوون.

(٥٢) پاشان (لەو هەموو هەڵانەتان) خۆشبووین بۆ ئەوەی سوپاسگوزاریی بکەن.

(٥٣) یادی ئەونیعمەتە بکەنەوە کاتێک کتێبی (تەورات)و جیاکەرەوەی (ڕەواو، ناڕەوامان) بەخشی بە موسا بۆ ئەوەی رێبازی هیدایەت بگرنەبەر (لە گومڕایی رزگارتان ببێت).

(٥٤) یادی ئەو نیعمەتە بکەنەوە کاتێک موسا بە قەوم و هۆزی خۆی وت: ئەی قەوم و هۆزەکەم بەراستی ئێوە بەو گوێرەکە پەرستی‌یە ستەمتان لە خۆتان کردووە، دەی بگەڕێنەوە بۆ لای بەدیهێنەرتان و تەوبە بکەن و ئینجا خۆتان بکوژن (بێ تاوان تاوانبار بکوژێت)، ئەوە باشترە بۆتان (چونکە تاوانەکەتان زۆر گەورەیە) پاشان ئەویش (واتە خوا دوای لەناو بردنی هەندێک لە تاوانباران) تۆبەی وەرگرت (لەوانەی مابوون)، لە راستیدا تەنها ئەو زاتە هێجگار تەوبە وەرگرو بە ڕەحم و دلۆڤانە.

(٥٥) یادی ئەو نیعمەتە بکەنەوە کە وتتان: ئەی موسا هەرگیز باوەڕت پێناهێنین تا وەکو بە ئاشکراو بە چاوی خۆمان خوا نەبینین، ئیتر یەکسەر هەورە بروسکەکە لێی دان، لەکاتێکدا کە تەماشاتان دەکردو بە دەورو بەری خۆتاندا دەتانڕوانی (بەسەرسامیەوە بیرتان دەکردەوە).

(٥٦) پاشان زیندوومان کردنەوەو ژیانمان پێبەخشینەوە لە دوای ئەو مەرگەتان بۆ ئەوەی سوپاسگوزاریی بکەن.

(٥٧) (هەروەها) لە نازو نیعمەتەکانی خوا بۆتان ئەوەیە: ئێمە هەورمان بۆ کردن بەسێبەرو گەزۆمان بۆ باراندن و پەلەوەری شەلاقەمان بۆ ناردن، دە بخۆن لەو رزق و ڕۆزییە چاکانەی کە پێمان بەخشیوون (بەڵام لەبەر بێ دینی و ستەمیان تۆڵەمان لێسەندن)، جا وەنەبێت ئەوانە ستەمیان لە ئێمە کرد بێت بەڵکو هەر ستەمیان لە خۆیان دەکرد.

وَإِذْ قُلْنَا ٱدْخُلُوا۟ هَٰذِهِ ٱلْقَرْيَةَ فَكُلُوا۟ مِنْهَا حَيْثُ شِئْتُمْ رَغَدًا وَٱدْخُلُوا۟ ٱلْبَابَ سُجَّدًا وَقُولُوا۟ حِطَّةٌ نَّغْفِرْ لَكُمْ خَطَٰيَٰكُمْ ۚ وَسَنَزِيدُ ٱلْمُحْسِنِينَ ﴿٥٨﴾ فَبَدَّلَ ٱلَّذِينَ ظَلَمُوا۟ قَوْلًا غَيْرَ ٱلَّذِى قِيلَ لَهُمْ فَأَنزَلْنَا عَلَى ٱلَّذِينَ ظَلَمُوا۟ رِجْزًا مِّنَ ٱلسَّمَآءِ بِمَا كَانُوا۟ يَفْسُقُونَ ﴿٥٩﴾ ۞ وَإِذِ ٱسْتَسْقَىٰ مُوسَىٰ لِقَوْمِهِۦ فَقُلْنَا ٱضْرِب بِّعَصَاكَ ٱلْحَجَرَ ۖ فَٱنفَجَرَتْ مِنْهُ ٱثْنَتَا عَشْرَةَ عَيْنًا ۖ قَدْ عَلِمَ كُلُّ أُنَاسٍ مَّشْرَبَهُمْ ۖ كُلُوا۟ وَٱشْرَبُوا۟ مِن رِّزْقِ ٱللَّهِ وَلَا تَعْثَوْا۟ فِى ٱلْأَرْضِ مُفْسِدِينَ ﴿٦٠﴾ وَإِذْ قُلْتُمْ يَٰمُوسَىٰ لَن نَّصْبِرَ عَلَىٰ طَعَامٍ وَٰحِدٍ فَٱدْعُ لَنَا رَبَّكَ يُخْرِجْ لَنَا مِمَّا تُنۢبِتُ ٱلْأَرْضُ مِنۢ بَقْلِهَا وَقِثَّآئِهَا وَفُومِهَا وَعَدَسِهَا وَبَصَلِهَا ۖ قَالَ أَتَسْتَبْدِلُونَ ٱلَّذِى هُوَ أَدْنَىٰ بِٱلَّذِى هُوَ خَيْرٌ ۚ ٱهْبِطُوا۟ مِصْرًا فَإِنَّ لَكُم مَّا سَأَلْتُمْ ۗ وَضُرِبَتْ عَلَيْهِمُ ٱلذِّلَّةُ وَٱلْمَسْكَنَةُ وَبَآءُو بِغَضَبٍ مِّنَ ٱللَّهِ ۗ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ كَانُوا۟ يَكْفُرُونَ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ وَيَقْتُلُونَ ٱلنَّبِيِّـۧنَ بِغَيْرِ ٱلْحَقِّ ۗ ذَٰلِكَ بِمَا عَصَوا۟ وَّكَانُوا۟ يَعْتَدُونَ ﴿٦١﴾



(٥٨) یادی ئەو نیعمەتە بکەنەوە کاتێک وتمان: بچنە ئەم شارەوە (کە قودسە)، جا هەرچی حەزی لێدەکەن لەوێ لە هەر جێیەکی بەفراوانی و خۆشی بیخۆن، لە دەروازەی شارەکە بەڕێزو کڕنووشی (پێزانینەوە) بچنە ژوورەوە و بڵێن: خوایە لە تاوانەکانمان ببوورە، ئەو کاتە ئێمەش لە هەڵە و تاوانەکانتان دەبوورین، ئێمە پاداشتی چاکەکاران لە ئایندەدا زۆر بە زیادەوە دەدەینەوە.

(٥٩) کەچی ئەوانەی ستەمیان کردبوو یەکسەر گوفتارەکەیان گۆڕی بەشتێک بێجگە لەوەی پێیان وترا بوو (واتە بە لووت بەرزیەوە چوونە ژوورەوە)، جا ئێمەش لە ئاسمانەوە سزایەکمان دابەزاندە سەر ئەوانەی ستەمیان کرد بەهۆی ئەوەی لە فەرمانی خوا دەردەچوون.

(٦٠) یادی ئەو نیعمەتە بکەنەوە کاتێک موسا بۆ قەوم و گەلەکەی خۆی داوای بارینی بارانی کرد، ئێمەش پێمان وت: بە گۆچانەکەت بدە بە (تاشە) بەردەکەدا (جا هەر کە ئەو کارەی ئەنجامدا) بەردەکە دوانزەکانی لێ هەڵقوڵا، بێگومان هەر هۆزێک چاوگەی خۆی ناسی (ئینجا پێمان وتن) دە بخۆن و بخۆنەوە لە ڕزق و ڕۆزی و بەخششی خواو تاوان و خراپە مەکەن لەسەر زەویدا لە کاتێکدا کە بەچاندنی تۆوی خراپەوە خەریکن.

(٦١) یادی ئەو نیعمەتە بکەنەوە کاتێک بە موساتان وت: ئێمە هەرگیز لەسەر یەک جۆر خۆراک ئۆقرە ناگرین و بەتەنها جۆرێک خواردەمەنی ڕازی نین، لەبەرئەوە داوا لە پەروەردگارت بکە لە ڕزق و ڕۆزی و بەرو بوومی زەویمان بۆ بەرهەم بهێنێت لە ڕووەکی پاقلەیی وخەیارو سیرو نیسک و پیاز، موسا پێی وتن: باشە چۆن ئێوە شتی کەم و نایەخ و ناتەواو وەردەگرن لەجیاتی شتی لەو چاکترو باشتر؟ دە دابەزن بۆ شارێک (بیابانی سینا، بەجێبهێڵن) ئینجا بەراستی ئەوەی داوای دەکەن دەستتان دەکەوێت.

(جابەهۆی ئەو بیروباوەڕو بیانوو گرتن و لاسارییەیانەوە) سوکیی و ریسوایی و لاتی و زەبوونی درا بەسەریاندا و شایانی خەشم و قینی خوایش بوون، چونکە ئەوان بەراستی باوەڕیان نەدەکرد بەئایەتەکانی خواو، پێغەمبەرەکانیان بەناحەق دەکوشت، ئەوەش بەهۆی ڕۆچوونیانەوە لەیاخی بوون و نافەرمانیدا، هەمیشە دەستدرێژیان دەکرد (ئێستەش بەردەوامن لەسەر بەرنامەی باوو باپیرانی خوانەناسیان).

إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَٱلَّذِينَ هَادُواْ وَٱلنَّصَٰرَىٰ وَٱلصَّٰبِـِٔينَ
مَنْ ءَامَنَ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْءَاخِرِ وَعَمِلَ صَٰلِحًا فَلَهُمْ أَجْرُهُمْ
عِندَ رَبِّهِمْ وَلَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ ﴿٦٢﴾ وَإِذْ
أَخَذْنَا مِيثَٰقَكُمْ وَرَفَعْنَا فَوْقَكُمُ ٱلطُّورَ خُذُواْ مَآ ءَاتَيْنَٰكُم
بِقُوَّةٍ وَٱذْكُرُواْ مَا فِيهِ لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ ﴿٦٣﴾ ثُمَّ تَوَلَّيْتُم مِّنۢ
بَعْدِ ذَٰلِكَ فَلَوْلَا فَضْلُ ٱللَّهِ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَتُهُۥ لَكُنتُم مِّنَ
ٱلْخَٰسِرِينَ ﴿٦٤﴾ وَلَقَدْ عَلِمْتُمُ ٱلَّذِينَ ٱعْتَدَواْ مِنكُمْ فِى ٱلسَّبْتِ
فَقُلْنَا لَهُمْ كُونُواْ قِرَدَةً خَٰسِـِٔينَ ﴿٦٥﴾ فَجَعَلْنَٰهَا نَكَٰلًا لِّمَا
بَيْنَ يَدَيْهَا وَمَا خَلْفَهَا وَمَوْعِظَةً لِّلْمُتَّقِينَ ﴿٦٦﴾ وَإِذْ قَالَ
مُوسَىٰ لِقَوْمِهِۦٓ إِنَّ ٱللَّهَ يَأْمُرُكُمْ أَن تَذْبَحُواْ بَقَرَةً قَالُوٓاْ أَتَتَّخِذُنَا
هُزُوًا قَالَ أَعُوذُ بِٱللَّهِ أَنْ أَكُونَ مِنَ ٱلْجَٰهِلِينَ ﴿٦٧﴾ قَالُواْ
ٱدْعُ لَنَا رَبَّكَ يُبَيِّن لَّنَا مَا هِىَ قَالَ إِنَّهُۥ يَقُولُ إِنَّهَا بَقَرَةٌ لَّا فَارِضٌ
وَلَا بِكْرٌ عَوَانٌۢ بَيْنَ ذَٰلِكَ فَٱفْعَلُواْ مَا تُؤْمَرُونَ ﴿٦٨﴾
قَالُواْ ٱدْعُ لَنَا رَبَّكَ يُبَيِّن لَّنَا مَا لَوْنُهَا قَالَ إِنَّهُۥ يَقُولُ
إِنَّهَا بَقَرَةٌ صَفْرَآءُ فَاقِعٌ لَّوْنُهَا تَسُرُّ ٱلنَّٰظِرِينَ ﴿٦٩﴾

(٦٢) بێگومان ئەوانەی باوەڕیان هێناوە (لە ئوممەتی محمد ﷺ)، ئەوانەش بوونەتە جوولەکە (شوێنکەوتەی راستەقینەی موسان)، گاورەکانیش (کە شوێنکەوتەی راستەقینەی عیسان)، (صابئە)ش (کە شوێنکەوتەی راستەقینەی داودن)، ئەوانە هەر دەستەیەکیان باوەڕی دامەزراوی هێنا بێت بەخوا و رۆژی دوایی و کارو کردەوەی چاکەی ئەنجام دابێت، جا ئەوانە پاداشتیان لای پەروەردگاریانە، نە ترس و بیمیان دەبێت، نە غەم و پەژارەش روویان تێدەکات.

(٦٣) یادی ئەو نیعمەتەش بکەنەوە کاتێک پەیمانمان لێوەرگرتن (کە پەیڕەوی تەورات بکەن)و کێوی طورمان بەڕاسەرتانەوە راگرت و پێمان وتن: ئەو بەرنامەیەی پێماندداون بە توندی بیگرن (ئەگینا ئەم چیایە دەدەین بەسەرتاندا)، هەمیشەش با لە بیرتان بێت چی تێدایەو چیتان لێدەخوازێت، بۆ ئەوەی لە خوا ترس و پارێزکاربن.

(٦٤) کەچی پاش ئەوانە هەمووی رووتان وەرچەرخاند لە رێبازی خوا، (پەیمانەکەتان شکاند)، ئەوکاتە ئەگەر بەزەیی و یارمەتی و فەزڵی خوا نەبوایە لە سەرتان، ئەوە دەچوونە ریزی خەسارەتمەندانەوە.

(٦٥) سوێند بە خوا بێگومان زانیووتانە و ئاگادارن چیمان بەسەر ئەوانەتاندا هێنا رۆژانی شەممە دەستدرێژییان دەکردو لە سنوور دەردەچوون، (لەبەر ئەوە بڕیارمانداو) وتمان: ببنە مەیموونی دوورخراوە لە رەحمەتی خوا(بڕیار بوو جوولەکەکانی شارەکەی قەراغ دەریا۔ ئیلیە ۔ رۆژانی شەممە تەرخان بکەن بۆ خواپەرستی و راوەماسی تیادانەکەن، دیارە ماسییەکانیش هەستیان بەوە کردووە، بۆیە لەو رۆژەدا خۆیان نواندووە، جولەکەش بەسروشت زۆر بەتەماعن، بیریان کردەوە لە تەگبیرو فێڵێک، ئەویش بەوەی کە لە رۆژی هەینیدا داوو تۆڕیان بۆ بنێنەوە تا لە شەممەدا تێی بکەون، رۆژی یەک شەممە چی کەوتۆتە داوو تۆڕەکانەوە دەری بهێنن (لە تەفسیری ئایەتی ١٦٣ تا ١٦٦، لە سوورەتی ۔ الأعراف ۔ دا ئەم رووداوە باسکراوە).

(٦٦) ئینجا ئەو بە مەیموون کردنەمان گێڕا بە پەندو عیبرەت بۆ ئەوانەی کە: هاوچەرخی رووداوەکە بوون و بۆ ئەوانەش لە دوای ئەوان دێن، هەروەها کردمانە ئامۆژگاری بۆ خواناس و پارێزکاران.

(٦٧) یادی ئەو نیعمەتە بکەنەوە کاتێک موسا بە قەومەکەی وت: بێگومان خوا فەرمانتان پێدەدات کە مانگایەک سەر ببڕن (کاتێک یەکێکیان لیّ کوژرا بوو، بکوژەکەش لای زۆربەیان نادیاربوو، هاناو هاواریان برد بۆموسا) وتیان: ئایا دەمانکەیتە گاڵتە جاڕی خۆت؟ موسا وتی: پەنا دەگرم بەخوا بچمە ریزی نەفامانەوە(گاڵتە بە خەڵکی بکەم).

(٦٨) ئینجا وتیان: (جا کەوایە) لە پەروەردگارت داوا بکە بۆمان روون بکاتەوە ئەو مانگایە کامەیە؟ موسا وتی: بەراستی خوا دەفەرموێت: ئەو مانگایە نە پیرەو نە پارێنە بەڵکو میانەساڵە، (ئیتر ئەوەندە قووڵی مەکەنەوەو لەسەری مەڕۆن) چ فەرمانێکتان پێدراوە جێ بەجێی بکەن.

(٦٩) کەچی وتیان: لە پەروەردگارت داوا بکە بزانین رەنگی چۆنە؟ موسا وتی: بێگومان خوا دەفەرموێت: ئەو مانگایە مانگایەکی ڕەنگ زەردی تۆخە، تەماشاکارانی دڵخۆش دەکات.

قَالُوا ادْعُ لَنَا رَبَّكَ يُبَيِّن لَّنَا مَا هِيَ إِنَّ الْبَقَرَ تَشَابَهَ عَلَيْنَا وَإِنَّا
إِن شَاءَ اللَّهُ لَمُهْتَدُونَ ﴿٧٠﴾ قَالَ إِنَّهُ يَقُولُ إِنَّهَا بَقَرَةٌ لَّا ذَلُولٌ
تُثِيرُ الْأَرْضَ وَلَا تَسْقِي الْحَرْثَ مُسَلَّمَةٌ لَّا شِيَةَ فِيهَا قَالُوا
الْآنَ جِئْتَ بِالْحَقِّ فَذَبَحُوهَا وَمَا كَادُوا يَفْعَلُونَ ﴿٧١﴾ وَإِذْ
قَتَلْتُمْ نَفْسًا فَادَّارَأْتُمْ فِيهَا وَاللَّهُ مُخْرِجٌ مَّا كُنتُمْ تَكْتُمُونَ ﴿٧٢﴾
فَقُلْنَا اضْرِبُوهُ بِبَعْضِهَا كَذَٰلِكَ يُحْيِي اللَّهُ الْمَوْتَىٰ وَيُرِيكُمْ
آيَاتِهِ لَعَلَّكُمْ تَعْقِلُونَ ﴿٧٣﴾ ثُمَّ قَسَتْ قُلُوبُكُم مِّن بَعْدِ ذَٰلِكَ
فَهِيَ كَالْحِجَارَةِ أَوْ أَشَدُّ قَسْوَةً وَإِنَّ مِنَ الْحِجَارَةِ لَمَا يَتَفَجَّرُ
مِنْهُ الْأَنْهَارُ وَإِنَّ مِنْهَا لَمَا يَشَّقَّقُ فَيَخْرُجُ مِنْهُ الْمَاءُ وَإِنَّ
مِنْهَا لَمَا يَهْبِطُ مِنْ خَشْيَةِ اللَّهِ وَمَا اللَّهُ بِغَافِلٍ عَمَّا تَعْمَلُونَ
﴿٧٤﴾ ۞ أَفَتَطْمَعُونَ أَن يُؤْمِنُوا لَكُمْ وَقَدْ كَانَ فَرِيقٌ مِّنْهُمْ
يَسْمَعُونَ كَلَامَ اللَّهِ ثُمَّ يُحَرِّفُونَهُ مِن بَعْدِ مَا عَقَلُوهُ
وَهُمْ يَعْلَمُونَ ﴿٧٥﴾ وَإِذَا لَقُوا الَّذِينَ آمَنُوا قَالُوا آمَنَّا
وَإِذَا خَلَا بَعْضُهُمْ إِلَىٰ بَعْضٍ قَالُوا أَتُحَدِّثُونَهُم بِمَا فَتَحَ
اللَّهُ عَلَيْكُمْ لِيُحَاجُّوكُم بِهِ عِندَ رَبِّكُمْ أَفَلَا تَعْقِلُونَ ﴿٧٦﴾



(٧٠) کەچی هەر وتیان: لە پەروەردگارت داوا بکە تا بەتەواوی بۆمان روون بکاتەوە بزانین کامەیە؟! چونکە بەراستی ئەم گا گەلە سەری لیٚ تێکٛ داوین و رەنگی زۆربەیان لە یەکٛ دەچێت، ئەو مانگایەمان بۆ نادۆزرێتەوە، بەراستی ئێمە ـ ئەگەر خوا ویستی لەسەر بێت ـ رێنموویی وەردەگرین.

(٧١) موسا وتی: بەراستی خوا دەفەرموێت: ئەوە مانگایەکە هێشتا رانەهێنراوە زەوی بکێڵێت و جووت بکات، ئاودێری کشتوکاڵیش ناکات، بیٚ عەیبەو یەکٛ رەنگەو هیچ پەڵەیەکی تێدانییە، ئەوسا وتیان: ئا ئێستە ئیتر هەواڵی راستەقینەت پێداین، (ئیتر دوای هەولٚ و کۆششێکی زۆر بەدەستیان هێنا) و سەریان بڕی، هەرچەندە خەریکٛ بوو ئەو کارەش نەکەن.

(٧٢) (یادی نیعمەتی ئاشکرا بوونی بکوژەکە بکەنەوە) چۆن کاتێکٛ کەسێکتان کوشت و یەکسەر ئاژاوە لە نێوانتاندا بەرپابوو، خوایش ئەوەی دەتانشاردەوە دەریخست و ئاشکرای کرد (کە بکوژ کێیە).

(٧٣) ئینجا وتمان: بە پارچەیەکٛ لەو مانگا سەربڕاوە بدەن بە لاشەی کوژراوەکەدا (دیارە بەویستی خوا وەکٛ موعجیزەیەکٛ کوژراوەکە زیندوو بۆتەوەو راستی بکوژەکەی خۆی وتووە)، جا ئا بەو شێوەیەو بە ئاسانی، خوا مردوان زیندوو دەکاتەوەو دەسەڵاتی خۆیتان نیشان دەدات بۆ ئەوەی تێبگەن و ژیر بن.

(٧٤) پاشان لەوەودوا دڵەکانتان رەق بوو، (ئەی جولەکەکان) هەر وەکٛ بەرد، بەڵکو رەقتریش (چونکە) بەراستی بەرد هەیە رووباری لیٚ هەڵدەقوڵێت، هەشیانە لەت لەت دەبێت و ئاوی لیٚ دێتە دەرەوە، هەشیانە لە ترسی خوا لە لوتکەی شاخەکان بەر دەبێتەوە، خوایش بێئاگا نیە لەو کاروکردەوانەی ئەنجامی دەدەن.

(٧٥) ئایا ئێوە (ئەی گرۆی ئیمانداران) بە تەمان و ئومێدەوارن کە جولەکە ئیمان و باوەڕ بهێنن بە ئاینەکەی ئێوە، لەکاتێکدا بێگومان دەستەیەکٛ لە شارەزاکانیان گوفتاری خوایان دەبیست لە (تەورات)دا، لەوەودوا دەسکاریان دەکرد دوای ئەوەی کە تێی گەیشتبوون و دەیانزانی راستیەکەی کامەیە.

(٧٦) (لەمەدینەدا جووەکان) هەرکاتێکٛ تووشی ئیمانداران دەهاتن دەیانوت: ئێمەش ئیمانمان هێناوەو (موسوڵمان بووین)، بەڵام کاتێکٛ پێکەوە کۆ دەبوونەوە لەگەڵ (بەناو زاناو دڵرەقەکانیان) بە یەکتریان دەوت: ئەوە بۆ ئێوە ئەو شتانەیان بۆ باس دەکەن کە خوا بۆ ئێوەی لە (تەورات)دا باسکردووە (دەربارەی پێغەمبەرایەتی محمد ﷺ) تاوەکو بیکەنە بەڵگە بەسەرتانەوە لای پەروەردگارتان!! ئایا ئێوە عەقڵتان بەو جۆرە شتانە ناشکێت و ژیریتان ناخەنەکار؟!

أَوَلَا يَعْلَمُونَ أَنَّ ٱللَّهَ يَعْلَمُ مَا يُسِرُّونَ وَمَا يُعْلِنُونَ ﴿٧٧﴾
وَمِنْهُمْ أُمِّيُّونَ لَا يَعْلَمُونَ ٱلْكِتَٰبَ إِلَّآ أَمَانِىَّ وَإِنْ هُمْ
إِلَّا يَظُنُّونَ ﴿٧٨﴾ فَوَيْلٌ لِّلَّذِينَ يَكْتُبُونَ ٱلْكِتَٰبَ بِأَيْدِيهِمْ
ثُمَّ يَقُولُونَ هَٰذَا مِنْ عِندِ ٱللَّهِ لِيَشْتَرُوا۟ بِهِۦ ثَمَنًا قَلِيلًا
فَوَيْلٌ لَّهُم مِّمَّا كَتَبَتْ أَيْدِيهِمْ وَوَيْلٌ لَّهُم مِّمَّا يَكْسِبُونَ
﴿٧٩﴾ وَقَالُوا۟ لَن تَمَسَّنَا ٱلنَّارُ إِلَّآ أَيَّامًا مَّعْدُودَةً قُلْ
أَتَّخَذْتُمْ عِندَ ٱللَّهِ عَهْدًا فَلَن يُخْلِفَ ٱللَّهُ عَهْدَهُۥٓ أَمْ تَقُولُونَ
عَلَى ٱللَّهِ مَا لَا تَعْلَمُونَ ﴿٨٠﴾ بَلَىٰ مَن كَسَبَ سَيِّئَةً
وَأَحَٰطَتْ بِهِۦ خَطِيٓـَٔتُهُۥ فَأُو۟لَٰٓئِكَ أَصْحَٰبُ ٱلنَّارِ هُمْ
فِيهَا خَٰلِدُونَ ﴿٨١﴾ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ
أُو۟لَٰٓئِكَ أَصْحَٰبُ ٱلْجَنَّةِ هُمْ فِيهَا خَٰلِدُونَ ﴿٨٢﴾ وَإِذْ
أَخَذْنَا مِيثَٰقَ بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ لَا تَعْبُدُونَ إِلَّا ٱللَّهَ وَبِٱلْوَٰلِدَيْنِ
إِحْسَانًا وَذِى ٱلْقُرْبَىٰ وَٱلْيَتَٰمَىٰ وَٱلْمَسَٰكِينِ وَقُولُوا۟
لِلنَّاسِ حُسْنًا وَأَقِيمُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتُوا۟ ٱلزَّكَوٰةَ ثُمَّ
تَوَلَّيْتُمْ إِلَّا قَلِيلًا مِّنكُمْ وَأَنتُم مُّعْرِضُونَ ﴿٨٣﴾

(٧٧) ئایا ئەوانە نازانن کە بەراستی خوا دەزانێت چی پەنهان دەکەن و چیش ئاشکرا دەکەن؟ (لە گوفتارو کردارو نیەتیان) .

(٧٨) هەندێ لەو جولەکانە نەشارەزا و نەخوێندەوارن، وادەزانن کتێبی (تەورات) بێجگە لە چەند ئاوات و هیوایەک هیچی تر نیە، ئەوانە هەر گومانیان کردۆتە پیشەی خۆیان (وا دەزانن بەهەشتیان بۆ خۆیان مسۆگەر کردووە).

(٧٩) سا واوەیلا بۆ ئەو کەسانەی کتێب دەنووسن بەدەستی خۆیان و پاشان دەڵێن: ئا ئەمە لەلایەن خواوەیە، تا کەمێک لە ماڵی دنیا بەدەست بهێنن ، جا وەیل بۆ ئەو دەست و (قەڵەمانەی) کە شتی وا دەنووسن و وەیل بۆ ئەو کەسانەی کە کەسابەتی ئاوا ئەنجام دەدەن.

(٨٠) جولەکەکان دەڵێن:(چەندە گوناهباربین) تەنها چەند رۆژێکی کەم لە دۆزەخدا دەمێنینەوە !! پێیان بڵێ: باشە، ئێوە پەیمانتان لە خوا وەرگرتووە، تا هەرگیز خوای گەورە پەیمان شکێنی نەکات؟! یان هەر دەتانەوێت شتێک بڵێن بەدەم خواوە کە هیچ بناغەیەکی نیەو هەر نازانن (چی دەڵێن)!!

(٨١) نەخێر وانییە، ئەوکەسەی گوناهو تاوان ئەنجام بدات و تاوانەکانی هەموولایەکی دابگرێت (ئاشکراو نادیاری) ئەو جۆرە کەسانە نیشتەجێی ئاگری دۆزەخن و بۆ هەمیشەیی تیایدا دەمێننەوە (لە هەر نەتەوەو هۆزو تیرەو تایەفەیەک بن).

(٨٢) ئەو کەسانەش باوەڕیان هێناوەو کارو کردەوە چاکەکان ئەنجام دەدەن، هەر ئەوانن نیشتەجێی بەهەشتن و تیایدا ژیانی هەتا هەتایی دەبەنە سەر (لە هەر چین و توێژو رەگەزێک بن).

(٨٣) یادی ئەو نیعمەتە بکەنەوە کاتێک پەیمانمان وەرگرت لەنەوەی ئیسرائیل کەجگە لەخوا کەسی تر نەپەرستن و لەگەڵ دایک و باوکدا چاکەکار بن، هەروەها لەگەڵ خزمان و هەتیوان و هەژارانیشداو گوفتاری چاک و جوان روو بە خەڵکی بڵێن، هەروەها نوێژەکانتان بەچاکی ئەنجام بدەن و زەکاتیش بدەن، پاشان ئێوە (لەجیاتی گوێڕایەڵی) پشتتان تێکرد، جگە لەکەمێکتان نەبێت، لەکاتێکدا زۆربەتان (لەو هەموو ئامۆژگارییە بەسوودانە) روو وەردەچەرخێنن و پشتی تێدەکەن.

وَإِذْ أَخَذْنَا مِيثَٰقَكُمْ لَا تَسْفِكُونَ دِمَآءَكُمْ وَلَا تُخْرِجُونَ أَنفُسَكُم مِّن دِيَٰرِكُمْ ثُمَّ أَقْرَرْتُمْ وَأَنتُمْ تَشْهَدُونَ ﴿٨٤﴾ ثُمَّ أَنتُمْ هَٰٓؤُلَآءِ تَقْتُلُونَ أَنفُسَكُمْ وَتُخْرِجُونَ فَرِيقًا مِّنكُم مِّن دِيَٰرِهِمْ تَظَٰهَرُونَ عَلَيْهِم بِٱلْإِثْمِ وَٱلْعُدْوَٰنِ وَإِن يَأْتُوكُمْ أُسَٰرَىٰ تُفَٰدُوهُمْ وَهُوَ مُحَرَّمٌ عَلَيْكُمْ إِخْرَاجُهُمْ ۚ أَفَتُؤْمِنُونَ بِبَعْضِ ٱلْكِتَٰبِ وَتَكْفُرُونَ بِبَعْضٍ ۚ فَمَا جَزَآءُ مَن يَفْعَلُ ذَٰلِكَ مِنكُمْ إِلَّا خِزْىٌ فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا ۖ وَيَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ يُرَدُّونَ إِلَىٰٓ أَشَدِّ ٱلْعَذَابِ ۗ وَمَا ٱللَّهُ بِغَٰفِلٍ عَمَّا تَعْمَلُونَ ﴿٨٥﴾ أُو۟لَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ ٱشْتَرَوُا۟ ٱلْحَيَوٰةَ ٱلدُّنْيَا بِٱلْءَاخِرَةِ ۖ فَلَا يُخَفَّفُ عَنْهُمُ ٱلْعَذَابُ وَلَا هُمْ يُنصَرُونَ ﴿٨٦﴾ وَلَقَدْ ءَاتَيْنَا مُوسَى ٱلْكِتَٰبَ وَقَفَّيْنَا مِنۢ بَعْدِهِۦ بِٱلرُّسُلِ ۖ وَءَاتَيْنَا عِيسَى ٱبْنَ مَرْيَمَ ٱلْبَيِّنَٰتِ وَأَيَّدْنَٰهُ بِرُوحِ ٱلْقُدُسِ ۗ أَفَكُلَّمَا جَآءَكُمْ رَسُولٌۢ بِمَا لَا تَهْوَىٰٓ أَنفُسُكُمُ ٱسْتَكْبَرْتُمْ فَفَرِيقًا كَذَّبْتُمْ وَفَرِيقًا تَقْتُلُونَ ﴿٨٧﴾ وَقَالُوا۟ قُلُوبُنَا غُلْفٌۢ ۚ بَل لَّعَنَهُمُ ٱللَّهُ بِكُفْرِهِمْ فَقَلِيلًا مَّا يُؤْمِنُونَ ﴿٨٨﴾

(٨٤) یادی ئەو نیعمەتە بکەنەوە کاتێک پەیمانمان لە ئێوە وەرگرت کە ئیتر خوێنی یەکتر (بە ناحەق) نەرێژن و یەکتر لە ماڵ و حاڵی خۆتان دەربەدەر نەکەن، پاشان بڕیاریشتان لەسەر ئەوەداو لەکاتێکدا خۆیشتان شایەتی لەسەر ئەمە دەدەن.

(٨٥) لەوەودوا ئێوە هەر ئەوانەن (ئاماژەیە بۆ جوولەکەکانی سەردەمی پێغەمبەر ﷺ) خەریکی یەکترکوشتنن، دەستەیەک لە (خزمانی) خۆتان لە ماڵ وحاڵی خۆیان دەربەدەر دەکەن پشتی یەکتر دەگرن دژ بە دەستەیەکتان بە تاوان و دوژمنایەتی، کەچی ئەگەر بەدیلی دەستی دوژمن بکەوتنایە ئەوا ئێوە فیدیەتان بۆ دەدان و ئازادتان دەکردن، لە حاڵێکدا دەربەدەرکردنەکەیان لەسەرتان حەرامە، کەوابوو چۆن دەبێت باوەڕتان بە بەشێکی (تەورات) هەبێت و بە بەشێکی تری باوەڕتان نەبێت؟ ئایا پاداشتی ئەوەتان کە ئەوکارە دەکات جگە لەسەر شۆڕیی و سووکی نەبێت لە ژیانی دنیادا هیچی تر هەیە؟ لە ڕۆژی قیامەتیشدا دەگەڕێنرێنەوە بۆ ناو سەختترین سزا، خوایش بێ ئاگانیە لەو کارانەی کە ئێوە ئەنجامی دەدەن.

(٨٦) ئەوانە، ئەوانەن کە ژیانی دنیایان کڕی و گۆڕیویانەتەوە بە ژیانی (بەهەشت)و دواڕۆژ، لەبەر ئەوە سزایان لەسەر کەم ناکرێتەوەو ئەوانە هەرگیز یارمەتی نادرێن و سەرناخرێن.

(٨٧) سوێند بێت بێگومان ئێمە تەوراتمان بەخشی بە موساو بەردەوام دوای ئەویش پێغەمبەرانمان ڕەوانە کردو بە عیسای کوری مەریەم بەڵگەو نیشانەو موعجیزەی جۆراو جۆرمان بەخشی هەروەها پشتگیریمان کرد بە فریشتە (جبرئیل)، ئایا چۆن دەبێت هەر کاتێک پێغەمبەرێکمان ڕەوانە کردبێت، بەڵام لەگەڵ ئارەزووەکانی ئێوەدا نەگونجا بێت، خۆتان بەزل زانیوەو لووتتان بەرز کردۆتەوەو بڕواتان نەهێناوە، ئەوسا دەستەیەکتان (بەرنامەی خواتان) بە درۆ زانیووەو هەندێکیشتان پێغەمبەرانتان دەکوشت.

(٨٨) هەروەها (جولەکەکانی سەردەمی پێغەمبەر ﷺ) وتیان: دڵەکانمان داخراوە (لە گوفتاری تۆ، تێناگەین) نەخێر وانییە، ئەوانە خوا نەفرینی لێکردوون بەهۆی کوفرو خوانەناسیانەوە، کەوابوو بە کەم شت بڕوا دەکەن.

وَلَمَّا جَآءَهُمْ كِتَٰبٌ مِّنْ عِندِ ٱللَّهِ مُصَدِّقٌ لِّمَا مَعَهُمْ وَكَانُوا۟ مِن قَبْلُ يَسْتَفْتِحُونَ عَلَى ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ فَلَمَّا جَآءَهُم مَّا عَرَفُوا۟ كَفَرُوا۟ بِهِۦ ۚ فَلَعْنَةُ ٱللَّهِ عَلَى ٱلْكَٰفِرِينَ ﴿٨٩﴾ بِئْسَمَا ٱشْتَرَوْا۟ بِهِۦٓ أَنفُسَهُمْ أَن يَكْفُرُوا۟ بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ بَغْيًا أَن يُنَزِّلَ ٱللَّهُ مِن فَضْلِهِۦ عَلَىٰ مَن يَشَآءُ مِنْ عِبَادِهِۦ ۖ فَبَآءُو بِغَضَبٍ عَلَىٰ غَضَبٍ ۚ وَلِلْكَٰفِرِينَ عَذَابٌ مُّهِينٌ ﴿٩٠﴾ وَإِذَا قِيلَ لَهُمْ ءَامِنُوا۟ بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ قَالُوا۟ نُؤْمِنُ بِمَآ أُنزِلَ عَلَيْنَا وَيَكْفُرُونَ بِمَا وَرَآءَهُۥ وَهُوَ ٱلْحَقُّ مُصَدِّقًا لِّمَا مَعَهُمْ ۗ قُلْ فَلِمَ تَقْتُلُونَ أَنۢبِيَآءَ ٱللَّهِ مِن قَبْلُ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ ﴿٩١﴾ ۞ وَلَقَدْ جَآءَكُم مُّوسَىٰ بِٱلْبَيِّنَٰتِ ثُمَّ ٱتَّخَذْتُمُ ٱلْعِجْلَ مِنۢ بَعْدِهِۦ وَأَنتُمْ ظَٰلِمُونَ ﴿٩٢﴾ وَإِذْ أَخَذْنَا مِيثَٰقَكُمْ وَرَفَعْنَا فَوْقَكُمُ ٱلطُّورَ خُذُوا۟ مَآ ءَاتَيْنَٰكُم بِقُوَّةٍ وَٱسْمَعُوا۟ ۖ قَالُوا۟ سَمِعْنَا وَعَصَيْنَا وَأُشْرِبُوا۟ فِى قُلُوبِهِمُ ٱلْعِجْلَ بِكُفْرِهِمْ ۚ قُلْ بِئْسَمَا يَأْمُرُكُم بِهِۦٓ إِيمَٰنُكُمْ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ ﴿٩٣﴾



(٨٩) كاتێك لە لایەن خواوە كتێبێك (قورئان) هات بۆیان، كە: ئەو كتێبانەی ئەوانیش پەسەند دەكات و بەراستی دەزانێت، ئەوان پێشتر داوای سەركەوتن و زاڵ بونیان بەسەر ئەوانەی بێ باوەڕ بوون لە خوا دەكرد بە هۆی شوێنكەوتنیان بۆ پێغەمبەر ﷺ، كەچی كاتێك ئەو پێغەمبەرەیان بۆ هات كە دەیاننناسی، بڕوایان پێ نەكرد، كەواتە با نەفرین و لەعنەتی خوا لەسەركافران بێت.

(٩٠) (ئەو جوولەكانە) خۆیان بەشتێكی ناپەسەند فرۆشت (هەڵوێستێكی نادروستیان نواند) كاتێك كافر بوون بەو قورئانەی خوا ناردوویەتی، (لە حەسوودی)و سەركەشیدا (ڕەخنەیان گرت و وتیان): بۆچی خوای گەورە دەرگای فەزڵ و لای ڕەحمەت دەكاتەوە لە هەركەسێك بیەوێت لە بەندەكانی!! ئەوسا ئیتر دووچاری یەك لە دوای یەكی رق و خەشمی خوا بوون (چونكە وەنەبێت تەنها كافر بوو بن بە محمد ﷺو بەقورئان، بەڵكو كافربوون بە موساو تەوراتیش كە داوای شوێنكەوتنی محمدیان لێدەكات)و بۆ كافرو خوانەناسان سزایەكی ریسواكەر ئامادەیە.

(٩١) كاتێك پێیان دەوترێت باوەڕ بهێنن بەوەی كە لە لایەن خواوە ڕەوانەكراوە، دەڵێن: ئێمە تەنها باوەڕمان بەوە هەیە كە بۆ ئێمە ڕەوانەكراوە و باوەڕ ناهێنن بە هەموو ئەوانەی كە دوای (تەورات) هاتووە وەكو (ئینجیل و قورئان) لەكاتێكدا كە هەر ئەو قورئانە حەق و راستیەو بەراست دانەری (تەورات)ی ئەوانیشە، پێیان بڵێ: ئەی كەواتە بۆچی پێشتر پێغەمبەرەكانی خواتان دەكوشت ئەگەر ئێوە ئیماندارن بە تەورات ؟!

(٩٢) سوێند بە خوا بەراستی موسا نیشانەی فرەو موعجیزەی زۆری بۆ هێنان، كەچی (كاتێ كەچوو بۆ نزای پەروەردگار، لە كێوی طور) ئێوە گوێرەكەكەتان پەرست، بەراستی ئێوە ستەمكارن.

(٩٣) (یادیان بێنەرەوە ئەو سەردەمەی) كە پەیمانمان لێ وەرگرتن و كێوی طورمان بەسەردا بەرزكردنەوە و (فەرمانمان پێدان): ئەوەی پێمان بەخشیوون (لە تەورات) بە توندی بیگرن و لێی لامەدەن و گوێ بیستبن، (بەدەم) وتیان: گوێڕایەڵین، (بەلام بەكردەوە) پێچەوانەیان كردو یاخی بوون و گوێرەكە پەرستی لە دڵ و دەروونیاندا ڕوابوو بە هۆی بێ باوەڕییانەوە، پێیان بڵێ: ئیمانەكەتان شتی ناڕەواتان پێ دەكات ئەگەر ئێوە ئیماندارن؟! (باوو باپیرانتان گوێرەكە پەرست و پێغەمبەر كوژ، ئێوەش سەرسەخت و بێ باوەڕ).

قُلۡ إِن كَانَتۡ لَكُمُ ٱلدَّارُ ٱلۡأٓخِرَةُ عِندَ ٱللَّهِ خَالِصَةٗ مِّن دُونِ ٱلنَّاسِ فَتَمَنَّوُاْ ٱلۡمَوۡتَ إِن كُنتُمۡ صَٰدِقِينَ ﴿٩٤﴾ وَلَن يَتَمَنَّوۡهُ أَبَدَۢا بِمَا قَدَّمَتۡ أَيۡدِيهِمۡۚ وَٱللَّهُ عَلِيمُۢ بِٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٩٥﴾ وَلَتَجِدَنَّهُمۡ أَحۡرَصَ ٱلنَّاسِ عَلَىٰ حَيَوٰةٖ وَمِنَ ٱلَّذِينَ أَشۡرَكُواْۚ يَوَدُّ أَحَدُهُمۡ لَوۡ يُعَمَّرُ أَلۡفَ سَنَةٖ وَمَا هُوَ بِمُزَحۡزِحِهِۦ مِنَ ٱلۡعَذَابِ أَن يُعَمَّرَۗ وَٱللَّهُ بَصِيرُۢ بِمَا يَعۡمَلُونَ ﴿٩٦﴾ قُلۡ مَن كَانَ عَدُوّٗا لِّجِبۡرِيلَ فَإِنَّهُۥ نَزَّلَهُۥ عَلَىٰ قَلۡبِكَ بِإِذۡنِ ٱللَّهِ مُصَدِّقٗا لِّمَا بَيۡنَ يَدَيۡهِ وَهُدٗى وَبُشۡرَىٰ لِلۡمُؤۡمِنِينَ ﴿٩٧﴾ مَن كَانَ عَدُوّٗا لِّلَّهِ وَمَلَٰٓئِكَتِهِۦ وَرُسُلِهِۦ وَجِبۡرِيلَ وَمِيكَىٰلَ فَإِنَّ ٱللَّهَ عَدُوّٞ لِّلۡكَٰفِرِينَ ﴿٩٨﴾ وَلَقَدۡ أَنزَلۡنَآ إِلَيۡكَ ءَايَٰتِۭ بَيِّنَٰتٖۖ وَمَا يَكۡفُرُ بِهَآ إِلَّا ٱلۡفَٰسِقُونَ ﴿٩٩﴾ أَوَكُلَّمَا عَٰهَدُواْ عَهۡدٗا نَّبَذَهُۥ فَرِيقٞ مِّنۡهُمۚ بَلۡ أَكۡثَرُهُمۡ لَا يُؤۡمِنُونَ ﴿١٠٠﴾ وَلَمَّا جَآءَهُمۡ رَسُولٞ مِّنۡ عِندِ ٱللَّهِ مُصَدِّقٞ لِّمَا مَعَهُمۡ نَبَذَ فَرِيقٞ مِّنَ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡكِتَٰبَ كِتَٰبَ ٱللَّهِ وَرَآءَ ظُهُورِهِمۡ كَأَنَّهُمۡ لَا يَعۡلَمُونَ ﴿١٠١﴾

(٩٤) (ئەی محمد ﷺ پێیان) بڵێ: ئەگەر ڕاست دەکەن و باوەڕتان وایە کە ماڵی ئەو دنیا (بەهەشت) لای خوا تایبەتەندە بە ئێوە نەک خەڵکی تر، دە ئاواتی مردن بخوازن ئەگەر ڕاست دەکەن (تا زوو بچنە ناو بەهەشت)!!

(٩٥) (بەڵام ئەوانە) هەرگیز بەهۆی ڕەفتاری نادروست و دەست پێشخەری ناپەسەندیانەوە ئاواتی مەرگ ناخوازن، خوایش چاک ئاگادارە لە حاڵی ستەمکاران.

(٩٦) سوێند بێت ئەو جولەکانە دەبینیت کە لە هەموو خەڵک بە پەرۆشترن لەسەر دنیاو ژیانی دنیا بەهەر جۆرێک بێت، هەتا بگرە لە هاوەڵپەرست و موشریکەکانیش، هەریەک لەوانە ئاوات دەخوازێت کە: هەزار ساڵ تەمەنی ببێت، هەر چەندە وەنەبێت تەمەنی درێژیان لە سزا ڕزگاریان بکات، خوایش زۆر بینایە بەو کردەوانەی کە ئەنجامی دەدەن.

(٩٧) (ئەی محمد ﷺ) پێیان بڵێ: هەر کەسێک دوژمنی جوبرەئیلە، (با بزانێت) کە هەر ئەو جوبرەئیلە بە فەرمانی خوا ئەو قورئانەی دابەزاندۆتە سەر دڵت کە کتێبە پێشووەکان بەڕاست دادەنێت ڕێنموویی (بۆ چاکە)دەکات و مژدە بەخشیشە بە ئیمانداران.

(٩٨) ئەو کەسەی دوژمن بێت بە خواو فریشتەکانی و پێغەمبەرەکانی، بەتایبەت جوبرەئیل و میکائیل، ئەوە با بزانێت و دڵنیا بێت کە خوای گەورە دوژمنی کافرو بێباوەڕانە.

(٩٩) سوێند بێت بە خوا ئێمە بێگومان نیشانەو ئایەتی ڕوونمان بۆ تۆ ناردووە (ئەی محمد ﷺ) کەس باوەڕی پێ لەق نابێت، جگە لە دەروون نەخۆش و یاخی بووەکان.

(١٠٠) ئەوە بۆ هەر جارێک پەیمانێکیان بەستبێت (لەگەڵ خواو پێغەمبەرو موسڵمانان‌دا) خێرا دەستەیەکیا پەیمانەکەیان شکاندووە، بەڵکو زۆربەی زۆریان باوەڕ ناهێنن (ڕێزو قەدری پەیمان و ئیمان ناگرن).

(١٠١) کاتێکیش کە پێغەمبەرێکیان لە لایەن خواوە بۆ هات (مەبەست حەزرەتی محمد ﷺ) لەگەڵ ئەوەشدا کە پشتگیری لە ڕاستی تەورات دەکات، دەستەیەک لە خاوەن کتێبەکان (جووەکان) کتێبی خوایان پشتگوێ خست خۆیان لێ گێل کرد، هەروەک هەواڵی وا نەزانن و (نەیان بیستبێت).

وَاتَّبَعُوا مَا تَتْلُوا الشَّيَاطِينُ عَلَى مُلْكِ سُلَيْمَانَ وَمَا كَفَرَ سُلَيْمَانُ وَلَكِنَّ الشَّيَاطِينَ كَفَرُوا يُعَلِّمُونَ النَّاسَ السِّحْرَ وَمَا أُنزِلَ عَلَى الْمَلَكَيْنِ بِبَابِلَ هَارُوتَ وَمَارُوتَ وَمَا يُعَلِّمَانِ مِنْ أَحَدٍ حَتَّى يَقُولَا إِنَّمَا نَحْنُ فِتْنَةٌ فَلَا تَكْفُرْ فَيَتَعَلَّمُونَ مِنْهُمَا مَا يُفَرِّقُونَ بِهِ بَيْنَ الْمَرْءِ وَزَوْجِهِ وَمَا هُم بِضَارِّينَ بِهِ مِنْ أَحَدٍ إِلَّا بِإِذْنِ اللَّهِ وَيَتَعَلَّمُونَ مَا يَضُرُّهُمْ وَلَا يَنفَعُهُمْ وَلَقَدْ عَلِمُوا لَمَنِ اشْتَرَاهُ مَا لَهُ فِي الْآخِرَةِ مِنْ خَلَاقٍ وَلَبِئْسَ مَا شَرَوْا بِهِ أَنفُسَهُمْ لَوْ كَانُوا يَعْلَمُونَ ﴿١٠٢﴾ وَلَوْ أَنَّهُمْ آمَنُوا وَاتَّقَوْا لَمَثُوبَةٌ مِّنْ عِندِ اللَّهِ خَيْرٌ لَّوْ كَانُوا يَعْلَمُونَ ﴿١٠٣﴾ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تَقُولُوا رَاعِنَا وَقُولُوا انظُرْنَا وَاسْمَعُوا وَلِلْكَافِرِينَ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿١٠٤﴾ مَّا يَوَدُّ الَّذِينَ كَفَرُوا مِنْ أَهْلِ الْكِتَابِ وَلَا الْمُشْرِكِينَ أَن يُنَزَّلَ عَلَيْكُم مِّنْ خَيْرٍ مِّن رَّبِّكُمْ وَاللَّهُ يَخْتَصُّ بِرَحْمَتِهِ مَن يَشَاءُ وَاللَّهُ ذُو الْفَضْلِ الْعَظِيمِ ﴿١٠٥﴾

(١٠٢) جا جووه‌كان (وازیان له كتێبی خوا ـ ته‌ورات ـ هێناو) شوێنی ئه‌وه كه‌وتن، كه شه‌یتانه‌كان ده‌یانخوێنده‌وه ده‌رباره‌ی ده‌سه‌ڵات و حكومه‌تی سوله‌یمان، (ئاشكرایه كه) هه‌رگیز سوله‌یمان كافر نه‌بووه، به‌ڵكو شه‌یتانه‌كان كافربوون و خه‌ڵكیان فێری سیحرو جادوو ده‌كرد، هه‌روه‌ها مه‌ردومیان فێری ئه‌وه ده‌كرد كه بۆ هاروت و ماروت دابه‌زی بوو (كه دوو فریشته بوون) له بابل (مه‌به‌ستیشیان تێگه‌یاندنی خه‌ڵكی بوو له سیحرو جادوو)، ئه‌وانیش كه‌سیان فێری هیچ شتێك نه‌ده‌كرد تا پێیان نه‌وتایه: ئه‌م كاره‌ی ئێمه بۆ تاقی كردنه‌وه‌یه‌و خۆت كافر مه‌كه (كه‌چی هه‌ندێك هه‌ر كۆڵیان نه‌داو) له‌و فریشتانه‌وه شتی وافێر ده‌بوون كه ژن و مێردی پێ له یه‌ك جوودا بكه‌ن، (هه‌ر چه‌نده) ئه‌و جادووگه‌رانه ناتوانن هیچ زیانێك به كه‌س بگه‌یه‌نن، مه‌گه‌ر ویستی خوای له‌سه‌ر بێت، ئه‌و خه‌ڵكه سه‌رگه‌ردانه هه‌میشه فێری شتێك ده‌بن كه زیانیان لێده‌داو سوودی نیه بۆیان، بێگومان ده‌شزانن ئه‌وه‌ی كاڵای وای كڕی بێت و شتی وافێر ببێت له‌و دونیا هیچ به‌هره‌یه‌كی ده‌ست ناكه‌وێت، (به‌ڕاستی) ئه‌و شته‌ی ئه‌وان خۆیان پێ فرۆشتووه و كه‌وتونه‌ته داوییه‌وه شتێكی زۆر ناپه‌سه‌نده ئه‌گه‌ر بزانن و تێبگه‌ن (چونكه سیحرو جادوو چه‌واشه كاریه و كارێكی نادروسته).

(١٠٣) خۆ ئه‌گه‌ر به‌ڕاستی ئه‌و جووله‌كانه ئیمان و باوه‌ڕیان بهێنایه و خۆیان بپاراستایه و جوانكار بوونایه (كه بێگومان ئه‌مه‌ش نایه‌ته دی) ئه‌وا پاداشتێكیان له لایه‌ن خوای گه‌وره‌وه كه چاكترو به‌فه‌ڕتر بوو ده‌ست ده‌كه‌وت، ئه‌گه‌ر بیانزانیایه (بیرو هۆشیان به‌كار بهێنایه).

(١٠٤) ئه‌ی ئه‌وانه‌ی باوه‌ڕتان هێناوه مه‌ڵێن (راعِنا) (چونكه له زمانی عیبریدا واتاكه‌ی ناشیرینه بۆ توانج و پلار به‌كار دێت، به‌ڵكو) بڵێن: (انظرنا) چاوه‌ڕێ و سه‌یرمان بكه و به چاكی ئه‌و فه‌رمانه له‌گوێ بگرن، (چونكه) بۆ كافرو بێباوه‌ران سزایه‌كی به ئێشمان ئاماده كردووه (به‌تایبه‌ت ئه‌وانه‌ی گاڵته به‌دین و ئیمان و موقه‌دده‌سات ده‌كه‌ن).

(١٠٥) چ ئه‌وانه‌ی كه كافرن له خاوه‌ن كتێبه ئاسمانیه‌كان، چ موشریك و هاوه‌ڵگه‌ران حه‌ز ناكه‌ن له‌لایه‌ن په‌روه‌ردگارتانه‌وه هیچ خێرو به‌ره‌كه‌تێك دابارێت بۆتان و روتان تێبكات، له‌گه‌ڵ ئه‌وه‌شدا خوا ره‌حمه‌تی خۆی تایبه‌ت ده‌كات به هه‌ر كه‌سێك (بیه‌وێت و شایسته بێت) هه‌ر خوایش خاوه‌نی فه‌زڵ و به‌خششی گه‌وره‌یه.

﴿مَا نَنسَخْ مِنْ آيَةٍ أَوْ نُنسِهَا نَأْتِ بِخَيْرٍ مِّنْهَا أَوْ مِثْلِهَا ۗ أَلَمْ تَعْلَمْ أَنَّ اللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ ﴿١٠٦﴾ أَلَمْ تَعْلَمْ أَنَّ اللَّهَ لَهُ مُلْكُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ ۗ وَمَا لَكُم مِّن دُونِ اللَّهِ مِن وَلِيٍّ وَلَا نَصِيرٍ ﴿١٠٧﴾ أَمْ تُرِيدُونَ أَن تَسْأَلُوا رَسُولَكُمْ كَمَا سُئِلَ مُوسَىٰ مِن قَبْلُ ۗ وَمَن يَتَبَدَّلِ الْكُفْرَ بِالْإِيمَانِ فَقَدْ ضَلَّ سَوَاءَ السَّبِيلِ ﴿١٠٨﴾ وَدَّ كَثِيرٌ مِّنْ أَهْلِ الْكِتَابِ لَوْ يَرُدُّونَكُم مِّن بَعْدِ إِيمَانِكُمْ كُفَّارًا حَسَدًا مِّنْ عِندِ أَنفُسِهِم مِّن بَعْدِ مَا تَبَيَّنَ لَهُمُ الْحَقُّ ۖ فَاعْفُوا وَاصْفَحُوا حَتَّىٰ يَأْتِيَ اللَّهُ بِأَمْرِهِ ۗ إِنَّ اللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ ﴿١٠٩﴾ وَأَقِيمُوا الصَّلَاةَ وَآتُوا الزَّكَاةَ ۚ وَمَا تُقَدِّمُوا لِأَنفُسِكُم مِّنْ خَيْرٍ تَجِدُوهُ عِندَ اللَّهِ ۗ إِنَّ اللَّهَ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ ﴿١١٠﴾ وَقَالُوا لَن يَدْخُلَ الْجَنَّةَ إِلَّا مَن كَانَ هُودًا أَوْ نَصَارَىٰ ۗ تِلْكَ أَمَانِيُّهُمْ ۗ قُلْ هَاتُوا بُرْهَانَكُمْ إِن كُنتُمْ صَادِقِينَ ﴿١١١﴾ بَلَىٰ مَنْ أَسْلَمَ وَجْهَهُ لِلَّهِ وَهُوَ مُحْسِنٌ فَلَهُ أَجْرُهُ عِندَ رَبِّهِ وَلَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ ﴿١١٢﴾

(١٠٦) هەرئایەتێک بسڕینەوە، یان بیخەینە باروودۆخی فەرامۆشییەوە و پشتگوێی بخەین، چاکتر لەو، یان وێنەی ئەو دەخەینە ڕوو، مەگەر نەتزانیوە کە خوا دەسەڵاتی بەسەر هەموو شتێکدا هەیە؟

(١٠٧) ئایا نەتزانیوە (ئەی محمد ﷺ، ئەی ئیماندار) کە بەڕاستی هەر خوا خاوەنی هەموو ئاسمانەکان و زەوییە، جگە لەو خوایە هیچ پشتیوان و یاریدەدەرێکتان نیە؟

(١٠٨) (ئەی هاوەڵان) ئاخۆ ئێوەش دەتانەوێت داخوازی (گەورەو ناقۆڵا) لە پێغەمبەرەکەتان (محمد ﷺ) بکەن، هەر وەک کاتی خۆی داخوازی لە موسا کرا، جا هەر کەسێک ئیمان و باوەڕ بگۆڕێتەوە بە کوفر، ئەوە بێگومان ڕێبازی ڕاست و دروستی وون کردووە.

(١٠٩) زۆرێک لە خاوەن کتێبەکان ئاواتە خوازن لەبەر حەسوودی و ناپاکی خۆیان ئەگەر بۆیان بکرێت بتانگێڕنەوە ڕیزی بێ باوەڕان ئەمەش دوای ئەوەی کە حەق و ڕاستییان بە تەواوی بۆ ڕوون بۆتەوە، بەڵام ئێوە هەر لێیان ببورن و لێیان مەگرن و چاوپۆشییان لێ بکەن، تا خواکاری خۆی ئەنجام دەدات و ویستی خۆی جێبەجێ دەکات، بێگومان خوا دەسەڵاتی بەسەر هەموو شتێکدا هەیە.

(١١٠) (کەواتە ئەی ئیمانداران) نوێژەکانتان بەچاکی ئەنجام بدەن و زەکاتیش بدەن (بە خاوەن مافەکان) و دڵنیا بن کە هەر کارێکی چاکە بۆ خۆتانی دەکەن، لای خوا بزر نابێت و دەستتان دەکەوێتەوە چونکە بەڕاستی خوا بیناو بە ئاگایە بەو کاروکردەوانەی کە ئەنجامی دەدەن.

(١١١) (جوولەکە و گاورەکان) دەڵێن: هەرگیز کەس ناچێتە بەهەشتەوە بێجگە لە جوولەکە یان گاور، جا ئەوە ئاوات و خەیاڵی خۆیانە (تۆش ئەی محمد ﷺ، یان ئەی ئیماندار) پێیان بڵێ: ئەگەر ڕاستگۆن، بەڵگەتان لەسەر ئەم قسەیە بهێننە مەیدانەوە (ئەگەر ئێوە بەهەشتی بن، ئەوا موسوڵمانانیش بەهەشتیە چونکە باوەڕیان بە موسا و عیسا هەیە).

(١١٢) نەخێر وانیە، هەرکەس بەڕاستی خۆی بداتە دەست خواو لەهەمان کاتدا چاکەکارو موسڵمان بێت، ئەوە پاداشتی خۆی لای پەروەردگاری دەست دەکەوێت و نەترسیان دەبێت و نەغەم و پەژارە دایان دەگرێت.

وَقَالَتِ ٱلْيَهُودُ لَيْسَتِ ٱلنَّصَٰرَىٰ عَلَىٰ شَىْءٍ وَقَالَتِ ٱلنَّصَٰرَىٰ
لَيْسَتِ ٱلْيَهُودُ عَلَىٰ شَىْءٍ وَهُمْ يَتْلُونَ ٱلْكِتَٰبَ كَذَٰلِكَ قَالَ
ٱلَّذِينَ لَا يَعْلَمُونَ مِثْلَ قَوْلِهِمْ فَٱللَّهُ يَحْكُمُ بَيْنَهُمْ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ
فِيمَا كَانُوا۟ فِيهِ يَخْتَلِفُونَ ﴿١١٣﴾ وَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّن مَّنَعَ مَسَٰجِدَ
ٱللَّهِ أَن يُذْكَرَ فِيهَا ٱسْمُهُۥ وَسَعَىٰ فِى خَرَابِهَآ أُو۟لَٰٓئِكَ مَا كَانَ
لَهُمْ أَن يَدْخُلُوهَآ إِلَّا خَآئِفِينَ لَهُمْ فِى ٱلدُّنْيَا خِزْىٌ
وَلَهُمْ فِى ٱلْءَاخِرَةِ عَذَابٌ عَظِيمٌ ﴿١١٤﴾ وَلِلَّهِ ٱلْمَشْرِقُ وَٱلْمَغْرِبُ
فَأَيْنَمَا تُوَلُّوا۟ فَثَمَّ وَجْهُ ٱللَّهِ إِنَّ ٱللَّهَ وَٰسِعٌ عَلِيمٌ ﴿١١٥﴾
وَقَالُوا۟ ٱتَّخَذَ ٱللَّهُ وَلَدًا سُبْحَٰنَهُۥ بَل لَّهُۥ مَا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ
وَٱلْأَرْضِ كُلٌّ لَّهُۥ قَٰنِتُونَ ﴿١١٦﴾ بَدِيعُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ
وَإِذَا قَضَىٰٓ أَمْرًا فَإِنَّمَا يَقُولُ لَهُۥ كُن فَيَكُونُ ﴿١١٧﴾ وَقَالَ ٱلَّذِينَ
لَا يَعْلَمُونَ لَوْلَا يُكَلِّمُنَا ٱللَّهُ أَوْ تَأْتِينَآ ءَايَةٌ كَذَٰلِكَ
قَالَ ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِم مِّثْلَ قَوْلِهِمْ تَشَٰبَهَتْ قُلُوبُهُمْ
قَدْ بَيَّنَّا ٱلْءَايَٰتِ لِقَوْمٍ يُوقِنُونَ ﴿١١٨﴾ إِنَّآ أَرْسَلْنَٰكَ
بِٱلْحَقِّ بَشِيرًا وَنَذِيرًا وَلَا تُسْـَٔلُ عَنْ أَصْحَٰبِ ٱلْجَحِيمِ ﴿١١٩﴾

(١١٣) جولەکە دەڵێن: گاورەکان لەسەر هیچ بنەماو راستییەک نین، گاورەکانیش دەڵێن جوولەکە لەسەر هیچ بنەماو راستییەک نین، لە کاتێکدا ئەوانە کتێبی (تەورات و ئینجیلیش دەخوێننەوە) هەروەها ئەوانەش کە هیچ نازانن (لە بتپەرستانی عەرەب) هەروا دەڵێن (بروایان بەئاینی ئیسلام و ئەوانیش نیە) خوایش لە رۆژی قیامەتدا دادگایی نێوانیان دەکات لەوەی کە ناکۆکن تیایدا.

(١١٤) جا کێ لەوە تاوانبارترو ستەمکارترە مزگەوتەکانی خوا قەدەغە دەکات لەوەی ناوی پیرۆزی ئەوی تیادا ببرێت و باسی ئاینی ئەوی تێدا بکرێت و هەوڵ بدات بۆ وێران کردنیان، ئەوانە بۆیان نیە بچنە مزگەوتەکانەوە مەگەر ترسی خوایان لەدڵدا بێت، ئەوانە تەنها سوکی و ریسوایی بەشیانە لە دنیاداو لە قیامەتیشدا سزای گەورەیان بۆ هەیە.

(١١٥) رۆژهەڵات و رۆژئاواو (هەموولایەک) هەر خوا خاوەنیەتی، جا روو بکەنە هەر لایەک خوا لەو جێیە ئاگای لێتانە، بەراستی خوا فراوانگیرو زانایە.

(١١٦) (جوولەکەو گاورو بت پەرستان) دەڵێن: خوا منداڵی بۆ خۆی داناوەو فەراهەمی هێناوە (لەکاتێکدا خوا پێویستی بەکەس نیە) نەخێر وانیە، بێگومان هەرچی لە ئاسمانەکان و زەویدا هەیە هەر خۆی خاوەنیەتی و هەر هەمووشیان ملکەچ و فەرمانبەرداری ئەوزاتەن.

(١١٧) (هەر ئەوزاتە) بەدیهێنەری ئاسمانەکان و زەویە بەجوانترین شێوە، جا هەر کاتێک بڕیاری هەر شتێک بدات، تەنها ئەوەندەی بەسە کە فەرمانی بوون یان پێشهاتنی بدات، ئیتر خێرا ئەو شتە، یان ئەو کارە، دەبێت و ئەنجام دەدرێت.

(١١٨) جا ئەوانەی نەفام و نەزانن دەیانگوت: بۆ خوا لەگەڵ ئێمە گفتوگۆ ناکات؟! یان موعجیزەو نیشانەیەکمان بۆ نایەت؟!!(شایانی باسە) کەسانی تریش پێش ئەمان هەمان شتیان دەوت، ئەمانە دڵەکانیان چوونیەکەو لەیەک دەچێت (شێوازی دەربڕینیان جیاوازە)، بێگومان ئێمە چەندەها بەڵگەو نیشانەی ئاشکراو روونمان دیاری کردووە بۆ ئەو کەسانەی کە راستی خوازن و بە شوێن حەقیقەتدا دەگەڕێن.

(١١٩) بەراستی (ئەی محمد ﷺ) ئێمە تۆمان هاوڕێ لەگەڵ حەق و راستەقینەکاندا رەوانە کردووە تا مژدەدەر بیت بە ئیمانداران و ترسێنەر بیت بۆ بێ باوەڕان، بێگومان تۆ هەرگیز بەرپرسیار نیت لە نیشتەجێکانی دۆزەخ.

وَلَن تَرْضَىٰ عَنكَ ٱلْيَهُودُ وَلَا ٱلنَّصَٰرَىٰ حَتَّىٰ تَتَّبِعَ مِلَّتَهُمْ ۗ قُلْ إِنَّ هُدَى ٱللَّهِ هُوَ ٱلْهُدَىٰ ۗ وَلَئِنِ ٱتَّبَعْتَ أَهْوَآءَهُم بَعْدَ ٱلَّذِى جَآءَكَ مِنَ ٱلْعِلْمِ ۙ مَا لَكَ مِنَ ٱللَّهِ مِن وَلِىٍّ وَلَا نَصِيرٍ ﴿١٢٠﴾ ٱلَّذِينَ ءَاتَيْنَٰهُمُ ٱلْكِتَٰبَ يَتْلُونَهُۥ حَقَّ تِلَاوَتِهِۦٓ أُو۟لَٰٓئِكَ يُؤْمِنُونَ بِهِۦ ۗ وَمَن يَكْفُرْ بِهِۦ فَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْخَٰسِرُونَ ﴿١٢١﴾ يَٰبَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ ٱذْكُرُوا۟ نِعْمَتِىَ ٱلَّتِىٓ أَنْعَمْتُ عَلَيْكُمْ وَأَنِّى فَضَّلْتُكُمْ عَلَى ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿١٢٢﴾ وَٱتَّقُوا۟ يَوْمًا لَّا تَجْزِى نَفْسٌ عَن نَّفْسٍ شَيْـًٔا وَلَا يُقْبَلُ مِنْهَا عَدْلٌ وَلَا تَنفَعُهَا شَفَٰعَةٌ وَلَا هُمْ يُنصَرُونَ ﴿١٢٣﴾ ۞ وَإِذِ ٱبْتَلَىٰٓ إِبْرَٰهِۦمَ رَبُّهُۥ بِكَلِمَٰتٍ فَأَتَمَّهُنَّ ۖ قَالَ إِنِّى جَاعِلُكَ لِلنَّاسِ إِمَامًا ۖ قَالَ وَمِن ذُرِّيَّتِى ۖ قَالَ لَا يَنَالُ عَهْدِى ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿١٢٤﴾ وَإِذْ جَعَلْنَا ٱلْبَيْتَ مَثَابَةً لِّلنَّاسِ وَأَمْنًا وَٱتَّخِذُوا۟ مِن مَّقَامِ إِبْرَٰهِۦمَ مُصَلًّى ۖ وَعَهِدْنَآ إِلَىٰٓ إِبْرَٰهِۦمَ وَإِسْمَٰعِيلَ أَن طَهِّرَا بَيْتِىَ لِلطَّآئِفِينَ وَٱلْعَٰكِفِينَ وَٱلرُّكَّعِ ٱلسُّجُودِ ﴿١٢٥﴾ وَإِذْ قَالَ إِبْرَٰهِۦمُ رَبِّ ٱجْعَلْ هَٰذَا بَلَدًا ءَامِنًا وَٱرْزُقْ أَهْلَهُۥ مِنَ ٱلثَّمَرَٰتِ مَنْ ءَامَنَ مِنْهُم بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْءَاخِرِ ۖ قَالَ وَمَن كَفَرَ فَأُمَتِّعُهُۥ قَلِيلًا ثُمَّ أَضْطَرُّهُۥٓ إِلَىٰ عَذَابِ ٱلنَّارِ ۖ وَبِئْسَ ٱلْمَصِيرُ ﴿١٢٦﴾



(١٢٠) هەرگیز جولەکە و گاورەکان لە تۆ (ئەی محمد ﷺ، ئەی ئیماندار) رازی نابن، هەتا بە تەواوی شوێن ئاین و بەرنامەیان نەکەویت، پێیان بڵێ: بەراستی هەر بەرنامەی خوا (ئاینی ئیسلام، شایستەی ئەوەیە کە هەموولایەکمان شوێنی بکەوین) هیدایەتی راست و دروست هەر لای ئەوە، خۆ ئەگەر شوێن نارەزووەکانی ئەوان بکەویت پاش ئەوەی زانیاری و زانستیت پێگەیشتووە، ئەوە بزانە کە لە لایەن خواوە هیچ سەرپەرشتیاری و یارمەتییەکت دەست ناکەوێت.

(١٢١) دەستەیەک لەوانەی کتێبمان پێبەخشیون (قورئان) بەچاکی و بەوردی دەوری دەکەنەوە، ئەوانە باوەڕیان پێی هەیەو باوەڕی پێ دەهێنن بەڵام ئەوەی بڕوای پێی نەبێت، ئا ئەو جۆرە کەسانە لە خەسارەتمەندو زەرەرمەندەکانن.

(١٢٢) ئەی نەوەی ئیسرائیل یادی ئەو نازو نیعمەتانە بکەن کە بەسەرتاندا ڕژاندوومە و من کاتی خۆی ڕێزی ئێوەم دابوو بەسەر هەموو دانیشتوانی ئەم جیهانەدا.

(١٢٣) خۆتان بپارێزن لە ڕۆژێک کە کەس لە جیاتی کەس تۆڵەو پاداشت ناداتەوە، بە هیچ شێوەیەک کەس فریای کەس ناکەوێت، کەس بارمتەی لێوەرناگیرێت و، تکاو پاڕانەوەی کەس بۆ کەسانیتر سوودی نابێت (یاخی و ستەمکارانیش) سەرکەوتوونابن و سەرناخرێن ...

(١٢٤) (یادی ئەوە بکەنەوە) پەروەردگاری ئیبراهیم، ئیبراهیمی تاقیکردەوە بە چەند فەرمان و بڕیارێک، ئەویش زۆر بە جوانی ئەنجامیدان، دوایی (کە لە هەموو تاقیکردنەوەکاندا سەرکەوت) خوا فەرمووی: من بڕیارمداوە بتکەمە پێشەوای خەڵکی، ئیبراهیم وتی: حەز دەکەم نەوەکانیشم لەوکارە پیرۆزە بێ بەهرە نەبن، خوا فەرمووی: پەیام و پەیمانی من بۆ ستەمکاران نابێت (با نەوەی تۆش بن).

(١٢٥) (یادی ئەوەش بکەنەوە) چۆن ئەمماڵەمان (کەعبە) کردە جێگای کۆبوونەوەی خەڵکی، کە بەوپەڕی هێمنی و ئاسایش و ئاسوودەییەوە لەوێ بەیەک بگەن (دە ئێوەش، خەڵکینە) مەقامی ئیبراهیم کە شوێنی تایبەتی خواپەرستی ئەو بوو، بیکەنە جێگای خواپەرستی و نوێژ، ئینجا فەرمانماندا بە ئیبراهیم و ئیسماعیل کە ئەو ماڵەم خاوێن بکەنەوە (لە چەپەڵی ماددی و مەعنەوی) بۆ ئەوانەی بەدەوریدا دەسوڕێنەوەو (طواف) دەکەن و تیایدا دەمێننەوەو (اعتكاف) دەکەن هەروەها بۆ کڕنووشبەران و سووژدەبەران.

(١٢٦) (یادی ئەوە بکەنەوە) کاتێک ئیبراهیم دۆعای کردو وتی: پەروەردگارا دەووروبەری ئەم ماڵەت بگێڕە بەشارێکی پڕ لە ئاسایش و ڕزق و ڕۆزی هەمەجۆر ببەخشە بەدانیشتوانی،(بەتایبەت) بەوانەی باوەڕیان بەخواو ڕۆژی دوایی هێناوە.

(خوای گەورە وەڵامی دایەوە کە دۆعات گیرایەو) فەرمووی: بەڵام ئەوەش کافرە بێ بەشی ناکەم لە بەرهەم و نازو نیعمەتی کەم تەمەنی ئەم دنیایە، بەڵام لەوەودوا بە ناچاریی تووشی سزای ئاگری دەکەم کە سەرئەنجام و چارەنووسێکی خراپە.

وَإِذْ يَرْفَعُ إِبْرَٰهِـۧمُ ٱلْقَوَاعِدَ مِنَ ٱلْبَيْتِ وَإِسْمَـٰعِيلُ رَبَّنَا تَقَبَّلْ مِنَّآ ۖ إِنَّكَ أَنتَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْعَلِيمُ ﴿١٢٧﴾ رَبَّنَا وَٱجْعَلْنَا مُسْلِمَيْنِ لَكَ وَمِن ذُرِّيَّتِنَآ أُمَّةً مُّسْلِمَةً لَّكَ وَأَرِنَا مَنَاسِكَنَا وَتُبْ عَلَيْنَآ ۖ إِنَّكَ أَنتَ ٱلتَّوَّابُ ٱلرَّحِيمُ ﴿١٢٨﴾ رَبَّنَا وَٱبْعَثْ فِيهِمْ رَسُولًا مِّنْهُمْ يَتْلُوا۟ عَلَيْهِمْ ءَايَـٰتِكَ وَيُعَلِّمُهُمُ ٱلْكِتَـٰبَ وَٱلْحِكْمَةَ وَيُزَكِّيهِمْ ۚ إِنَّكَ أَنتَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ ﴿١٢٩﴾ وَمَن يَرْغَبُ عَن مِّلَّةِ إِبْرَٰهِـۧمَ إِلَّا مَن سَفِهَ نَفْسَهُۥ ۚ وَلَقَدِ ٱصْطَفَيْنَـٰهُ فِى ٱلدُّنْيَا ۖ وَإِنَّهُۥ فِى ٱلْـَٔاخِرَةِ لَمِنَ ٱلصَّـٰلِحِينَ ﴿١٣٠﴾ إِذْ قَالَ لَهُۥ رَبُّهُۥٓ أَسْلِمْ ۖ قَالَ أَسْلَمْتُ لِرَبِّ ٱلْعَـٰلَمِينَ ﴿١٣١﴾ وَوَصَّىٰ بِهَآ إِبْرَٰهِـۧمُ بَنِيهِ وَيَعْقُوبُ يَـٰبَنِىَّ إِنَّ ٱللَّهَ ٱصْطَفَىٰ لَكُمُ ٱلدِّينَ فَلَا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَأَنتُم مُّسْلِمُونَ ﴿١٣٢﴾ أَمْ كُنتُمْ شُهَدَآءَ إِذْ حَضَرَ يَعْقُوبَ ٱلْمَوْتُ إِذْ قَالَ لِبَنِيهِ مَا تَعْبُدُونَ مِنۢ بَعْدِى قَالُوا۟ نَعْبُدُ إِلَـٰهَكَ وَإِلَـٰهَ ءَابَآئِكَ إِبْرَٰهِـۧمَ وَإِسْمَـٰعِيلَ وَإِسْحَـٰقَ إِلَـٰهًا وَٰحِدًا وَنَحْنُ لَهُۥ مُسْلِمُونَ ﴿١٣٣﴾ تِلْكَ أُمَّةٌ قَدْ خَلَتْ ۖ لَهَا مَا كَسَبَتْ وَلَكُم مَّا كَسَبْتُمْ ۖ وَلَا تُسْـَٔلُونَ عَمَّا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴿١٣٤﴾

(١٢٧) بە یاد بهێنن ئەو کاتەی ئیبراهیم پایەکانی کەعبەی بەرز دەکردەوە لەگەڵ ئیسماعیلدا و (دەیانوت): پەروەردگارا ئەم کارەمان لێ وەربگرەو لە ڕیزی چاکەکانماندا تۆماری بکە، چونکە بەراستی تۆ خوایەکی زۆر بیسەرو زانایت.

(١٢٨) پەروەردگارا، هەردووکمان وا لێ بکە تەنها فەرمانبەردارو ملکەچی تۆبین و لە نەوەکانیشمان ئوممەتێکی موسوڵمان و فەرمانبەردار بۆ خۆت فەراهەم بهێنە و چۆنیەتی ڕێبازی بەندایەتیمان فێربکە و نیشانمان بدەو تەوبە و پەشیمانیمان لێ وەربگرە، بێگومان تۆ خوایەکی زۆر تەوبە وەرگرو میهرەبان و دلۆڤانیت.

(١٢٩) پەروەردگارا، بۆ ئەو خەڵکەی کە لە ئایندەدا دێن پێغەمبەرێک لە خۆیان ڕەوانە بکە، تا ئایەتەکانی تۆیان بەسەردا بخوێنێتەوەو فێری کتێبە پیرۆزەکەی تۆ (واتە قورئان) و داناییان بکات، تا دڵ و دەروونیان لە ژەنگ و کردەوەیان لە ڕەوشتی ناپەسەند پاک بکاتەوە، بەراستی هەر تۆ خوایەکی باڵادەست و دانایت.

(١٣٠) ئایا کێ لە ئاینی ئیبراهیم پشت هەڵ دەکات، جگە لەو کەسەی کەخۆی گێل و نەفام بکات، سوێندبێت بێگومان ئێمە ئیبراهیممان لەم دنیایەدا هەڵبژاردووە (کردوومانە بەپێشەوا) بەراستی لەو دنیاش لە ریزی پیاو چاکاندایە.

(١٣١) کاتێک پەروەردگاری پێی وت: ملکەچ و فەرمانبەردار بە، (ئەویش خێرا) وتی: تەسلیمی پەروەردگاری هەموو جیهان بووم (باوەڕی پتەوم پێی هەیە).

(١٣٢) جا ئیبراهیم و یەعقوب ئەم وەسێتەیان کرد بۆ کوڕەکان و نەوەکانیان، (هەریەک لەوان فەرموویەتی): ڕۆڵەکانم؛ بەراستی خوا هەر ئەم ئاینەی بۆ ئێوە بڕیارداوەو هەڵی بژاردووە، ئیتر ئێوەش هەوڵ بدەن بە موسوڵمانی نەبێت مەمرن (تا دوا هەناسەتان پەیڕەوی بکەن).

(١٣٣) ئایا ئێوە (ئەی جولەکەو گاورانێک کە باوەڕ بەمحمد ناکەن و خۆشتان بەشوێنکەوتەی ئیبراهیم و یەعقوب دەزانن) ئامادەی سەرەمەرگی یەعقوب بوون؟ ئەوکاتەی بەکوڕەکانی وت: دوای مردنی من چی دەپەرستن؟! هەموو وتیان: خوای تۆ و باوو باپیرانت دەپەرستین، کە ئیبراهیم و ئیسماعیل و ئیسحاقن،خوایەکی تاک و تەنهایەو ئێمە هەموو تەسلیم و فەرمانبەرداری ئەوین.

(١٣٤) ئەوانە ئوممەتێک بوون ڕۆیشتن بەخۆیان و کردەوەی چاکیانەوە، ئێوەش هەرچی دەیکەن لە چاکە بۆ خۆتانە و بەرپرس نابن لە کارو کردەوەی ئەوان.

وَقَالُوا كُونُوا هُودًا أَوْ نَصَارَىٰ تَهْتَدُوا ۗ قُلْ بَلْ مِلَّةَ إِبْرَاهِيمَ حَنِيفًا ۖ وَمَا كَانَ مِنَ الْمُشْرِكِينَ ﴿١٣٥﴾ قُولُوا آمَنَّا بِاللَّهِ وَمَا أُنزِلَ إِلَيْنَا وَمَا أُنزِلَ إِلَىٰ إِبْرَاهِيمَ وَإِسْمَاعِيلَ وَإِسْحَاقَ وَيَعْقُوبَ وَالْأَسْبَاطِ وَمَا أُوتِيَ مُوسَىٰ وَعِيسَىٰ وَمَا أُوتِيَ النَّبِيُّونَ مِن رَّبِّهِمْ لَا نُفَرِّقُ بَيْنَ أَحَدٍ مِّنْهُمْ وَنَحْنُ لَهُ مُسْلِمُونَ ﴿١٣٦﴾ فَإِنْ آمَنُوا بِمِثْلِ مَا آمَنتُم بِهِ فَقَدِ اهْتَدَوا ۖ وَّإِن تَوَلَّوْا فَإِنَّمَا هُمْ فِي شِقَاقٍ ۖ فَسَيَكْفِيكَهُمُ اللَّهُ ۚ وَهُوَ السَّمِيعُ الْعَلِيمُ ﴿١٣٧﴾ صِبْغَةَ اللَّهِ ۖ وَمَنْ أَحْسَنُ مِنَ اللَّهِ صِبْغَةً ۖ وَنَحْنُ لَهُ عَابِدُونَ ﴿١٣٨﴾ قُلْ أَتُحَاجُّونَنَا فِي اللَّهِ وَهُوَ رَبُّنَا وَرَبُّكُمْ وَلَنَا أَعْمَالُنَا وَلَكُمْ أَعْمَالُكُمْ وَنَحْنُ لَهُ مُخْلِصُونَ ﴿١٣٩﴾ أَمْ تَقُولُونَ إِنَّ إِبْرَاهِيمَ وَإِسْمَاعِيلَ وَإِسْحَاقَ وَيَعْقُوبَ وَالْأَسْبَاطَ كَانُوا هُودًا أَوْ نَصَارَىٰ ۗ قُلْ أَأَنتُمْ أَعْلَمُ أَمِ اللَّهُ ۗ وَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّن كَتَمَ شَهَادَةً عِندَهُ مِنَ اللَّهِ ۗ وَمَا اللَّهُ بِغَافِلٍ عَمَّا تَعْمَلُونَ ﴿١٤٠﴾ تِلْكَ أُمَّةٌ قَدْ خَلَتْ ۖ لَهَا مَا كَسَبَتْ وَلَكُم مَّا كَسَبْتُمْ ۖ وَلَا تُسْأَلُونَ عَمَّا كَانُوا يَعْمَلُونَ ﴿١٤١﴾

(١٣٥) (کەچی هێشتا ئەوان بە موسوڵمانان) دەڵێن: وەرن ببنە جولەکە یان گاور تا بکەونە سەر ڕێگەی ڕاست!!
(ئەی محمد ﷺ پێیان) بڵێ: (نەخێر وانابین) بەڵکو شوێن ئاین و بەرنامەی ئیبراهیم دەکەوین کە پاک و دروستەو هەرگیز لە ڕیزی بت پەرستان و هاوەڵگەراندا نەبووە.
(١٣٦) (ئەی پەیڕەوانی محمد ﷺ ئێوە) بڵێن: ئێمە باوەڕمان بە خوا هێناوەو بەو قورئانەش کە دابەزیوە بۆمان و بەوەش کە دابەزیوە بۆ ئیبراهیم و ئیسماعیل و ئیسحاق و یەعقوب و نەوەکانی یەعقوب، هەروەها بەو پەیامەی کە بۆ موساو عیسا هاتووە و بەو پەیامانەی کە بۆ پێغەمبەران بەگشتی ڕەوانە کراوە لە لایەن پەروەردگاریانەوە و ئێمە جیاوازی ناکەین لە نێوان هیچ کام لەو پێغەمبەرانەدا، ئێمە هەموومان تەنها تەسلیمی فەرمانی پەروەردگارین.
(١٣٧) جا ئەگەر ئەوان (جولەکەو گاورەکان) باوەڕیان هێنا، وەک ئەوەی ئێوە باوەڕتان پێ هێناوە، ئەوە بەڕاستی مانای وایە ڕێبازی هیدایەتیان دۆزیوەتەوە، بەڵام ئەگەر پشتیان تێکرد، ئەوە بێگومان دەکەونە دژایەتی و دوبەرەکیەوە، (بەڵام دڵنیابە ئەی محمد ﷺ، ئەی ئیماندار) خوا تۆ دەپارێزێت لە پیلان و تەڵەکەیان چونکە ئەو خوایە زۆر بیسەرو زانایە.
(١٣٨) (ئەم ئاین و بەرنامەیە) ئەو ڕەنگ و نەخشەیەیە کەخوا دایڕشتووە، کێ هەیە لە خوا چاکتر ڕەنگ و نەخشەی جوان بکێشێت و دایڕێژێت، لە هەموو بارو دۆخێکدا ئێمەی ئیماندار هەر ئەو دەپەرستین.
(١٣٩) (بەو جوولەکانە) بڵێ: ئایا ڕەوایە ئێوە دەربارەی ئاینی خوا قرەو گاڵەو کێشەمان لەگەڵ دەکەن(دەتانەوێت پێغەمبەرایەتی هەر لەناو ئێوەدا بێت! لەکاتێکدا کە قەدری خوایش نازانن و کوڕو هاوسەری بۆ بڕیار دەدەن!!)، خۆتان چاک دەزانن کە ئەو خوایە پەروەردگاری ئێمە و ئێوەشە، کاروکردەوەی خۆمان بۆ خۆمان و کارو کردەوەی ئێوەش بۆ خۆتانە (ئێمە لە بۆچوون و کاروکردەوەتان بەرین)، ئێمە تەنها دڵسۆزو ملکەچی ئەو پەروەردگارەین.
(١٤٠) چۆن دەڵێن کە: ئیبراهیم و ئیسماعیل و ئیسحاق و یەعقوب و کوڕەکانی، جولەکە یان گاور بوون؟!! پێیان بڵێ: باشە ئایا ئێوە دەزانن یان خوا؟ جا کێ لەوە ستەمکارترە کە شایەتیەکی خوایی لەلابێت و شاردبێتیەوە بێگومان خوا بێ ئاگانیە لەو کاروکردەوانەی کە ئەنجامی دەدەن.
(١٤١) ئەوانە ئوممەتێک بوون ڕۆیشتن بەخۆیان و کردەوەی چاکیانەوە، ئێوەش هەرچی دەیکەن لە چاکە بۆ خۆتانە و بەرپرس نابن لە کاروکردەوەی ئەوان.



۞ سَيَقُولُ ٱلسُّفَهَآءُ مِنَ ٱلنَّاسِ مَا وَلَّىٰهُمْ عَن قِبْلَتِهِمُ ٱلَّتِي كَانُوا۟ عَلَيْهَا ۚ قُل لِّلَّهِ ٱلْمَشْرِقُ وَٱلْمَغْرِبُ ۚ يَهْدِي مَن يَشَآءُ إِلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ ﴿١٤٢﴾ وَكَذَٰلِكَ جَعَلْنَٰكُمْ أُمَّةً وَسَطًا لِّتَكُونُوا۟ شُهَدَآءَ عَلَى ٱلنَّاسِ وَيَكُونَ ٱلرَّسُولُ عَلَيْكُمْ شَهِيدًا ۗ وَمَا جَعَلْنَا ٱلْقِبْلَةَ ٱلَّتِي كُنتَ عَلَيْهَآ إِلَّا لِنَعْلَمَ مَن يَتَّبِعُ ٱلرَّسُولَ مِمَّن يَنقَلِبُ عَلَىٰ عَقِبَيْهِ ۚ وَإِن كَانَتْ لَكَبِيرَةً إِلَّا عَلَى ٱلَّذِينَ هَدَى ٱللَّهُ ۗ وَمَا كَانَ ٱللَّهُ لِيُضِيعَ إِيمَٰنَكُمْ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ بِٱلنَّاسِ لَرَءُوفٌ رَّحِيمٌ ﴿١٤٣﴾ قَدْ نَرَىٰ تَقَلُّبَ وَجْهِكَ فِي ٱلسَّمَآءِ ۖ فَلَنُوَلِّيَنَّكَ قِبْلَةً تَرْضَىٰهَا ۚ فَوَلِّ وَجْهَكَ شَطْرَ ٱلْمَسْجِدِ ٱلْحَرَامِ ۚ وَحَيْثُ مَا كُنتُمْ فَوَلُّوا۟ وُجُوهَكُمْ شَطْرَهُۥ ۗ وَإِنَّ ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْكِتَٰبَ لَيَعْلَمُونَ أَنَّهُ ٱلْحَقُّ مِن رَّبِّهِمْ ۗ وَمَا ٱللَّهُ بِغَٰفِلٍ عَمَّا يَعْمَلُونَ ﴿١٤٤﴾ وَلَئِنْ أَتَيْتَ ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْكِتَٰبَ بِكُلِّ ءَايَةٍ مَّا تَبِعُوا۟ قِبْلَتَكَ ۚ وَمَآ أَنتَ بِتَابِعٍ قِبْلَتَهُمْ ۚ وَمَا بَعْضُهُم بِتَابِعٍ قِبْلَةَ بَعْضٍ ۚ وَلَئِنِ ٱتَّبَعْتَ أَهْوَآءَهُم مِّنۢ بَعْدِ مَا جَآءَكَ مِنَ ٱلْعِلْمِ ۙ إِنَّكَ إِذًا لَّمِنَ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿١٤٥﴾

(١٤٢) نەفام و دەم بەتاڵەکان لە خەڵکی (دوای گۆڕینی ڕووگە لە قودسەوە بۆ کەعبە) دەڵێن: باشە چی وای لێکردن کە واز لە ڕووگە پێشوەکە بهێنن؟! کە جاران ڕوویان تێدەکرد، پێیان بڵێ: ڕۆژهەلات و ڕۆژئاوا و(هەموولایەک) خوا خاوەنیەتی، هەر کەسێکی بوێت ڕێنموویی دەکات بۆ ڕێگەو ڕێبازی ڕاست و ڕەوان.

(١٤٣) بەو شێوەیەش ئێوەمان بەگەلێکی میانڕەو گێڕاوە (لە هەموو ڕوویەکەوە، لە ڕووی عیبادەت و خواپەرستیەوە، لە ڕووی دنیاو قیامەتەوە، لە ڕووی داخوازیەکانی ڕۆح و نەفسەوە..هتد) تا ببنە شایەت بەسەر خەڵکیەوە (تا بزانن ئەم ئاین و بەرنامەیە هەمووی مایەی خێرو سەربەرزیە بۆ تاک و کۆمەڵ لە هەموو سەردەمێکدا و لە هەموو بوارەکانی ژیاندا) و بۆ ئەوەی پێغەمبەریش (لە هەموو ئەو بوارانەدا مامۆستاو ڕابەری ئێوە بێت و لە ڕۆژی قیامەتدا) شایەتی بدات (بۆ دڵسۆزانی ئوممەتی لەسەر ئەوەی بەئەرکی سەرشانی خۆیان هەستاون) و ئەو قیبلەو ڕووگەیەش ڕووت تێکردبوو(کە بیت المقدس بوو) گۆڕانکاریشمان بەسەردا هێنا تەنها بۆ ئەوە بوو بزانین و دەربکەوێت، کێ شوێنکەوتەی پێغەمبەردەبێت و کێش پاشەو پاش هەڵدەگەڕێتەوە، هەرچەندە (گۆڕینی قیبلە) بوو بەهۆی ناڕەحەتییەکی گەورە، مەگەر لەسەر ئەوانەی خوا دڵیانی دامەزراندبوو و ڕێنموویی کردبوون، بێگومان خوا ئیمان و باوەڕداریی و(نوێژتان) زایە ناکات، چونکە بەڕاستی خوا بۆ خەڵکی، زۆر بەسۆزو بە بەزەییە.

(١٤٤) (ئەی پێغەمبەر ﷺ) بەڕاستی چاوگێڕان و هەڵسوڕاني ڕووخسارت روو بەئاسمان دەبینین (کە بە هیوای ڕووگەیەکی تایبەتیت، ئێمەش ئاگاداری نیازی دڵت بووین) سوێند بەخوا ئێمەیش ڕووت وەردەچەرخێنین بۆ ڕووگەیەک پێی ڕازی و خۆشنوود بیت، دە ڕووت وەربچەرخێنە بەرەو لای کەعبە (المسجدالحرام) و ئێوەش ئەی موسوڵمانان لە هەر کوێ بوون، بەرەو لای ئەوێ ڕووتان وەربچەرخێنن، بەڕاستی ئەوانەش کتێبیان پێ‌گەیشتووە (لە گاورو جوو) چاک دەزانن کە(ئەم گۆڕانی ڕووگەیە) حەقیقەت و ڕاستیە و فەرمانی پەروەردگاریانە (لە تەورات و ئینجیلدا ئاماژەی بۆ کراوە) و خوا هەرگیز بێ‌ئاگا نیە لەو کارو کردەوانەی کە ئەنجامی دەدەن.

(١٤٥) سوێند بەخوا ئەگەر بچیت بۆ لای ئەوانەی کتێبیان بۆ هاتووە، بە هەر بەڵگەیەک بتەوێت شوێنی ڕاستی بکەون و ڕووبکەنە ڕووگەی تۆ، ڕووی تێناکەن و بەقسەت ناکەن، تۆش هەرگیز شوێنکەوتەی ڕووگەی ئەوان نابیت، ئەوانیش هەندێکیان شوێنکەوتەی ڕووگەی هەندێکی تریان نین، سوێند بەخوا ئەگەر تۆ شوێن هەواو ئارەزووی ئەوان بکەویت، دوای ئەوەی زانیاری تەواوت پێراگەیەنرا لەم بارەیەوە، بێگومان تۆ دەچیتە ڕیزی ستەمکارانەوە (ئەستەمە تۆ وابیت، ئەی فرستادەی خوا).

ٱلَّذِينَ ءَاتَيْنَٰهُمُ ٱلْكِتَٰبَ يَعْرِفُونَهُۥ كَمَا يَعْرِفُونَ أَبْنَآءَهُمْ ۖ وَإِنَّ فَرِيقًا مِّنْهُمْ لَيَكْتُمُونَ ٱلْحَقَّ وَهُمْ يَعْلَمُونَ ﴿١٤٦﴾ ٱلْحَقُّ مِن رَّبِّكَ ۖ فَلَا تَكُونَنَّ مِنَ ٱلْمُمْتَرِينَ ﴿١٤٧﴾ وَلِكُلٍّ وِجْهَةٌ هُوَ مُوَلِّيهَا ۖ فَٱسْتَبِقُوا۟ ٱلْخَيْرَٰتِ ۚ أَيْنَ مَا تَكُونُوا۟ يَأْتِ بِكُمُ ٱللَّهُ جَمِيعًا ۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ ﴿١٤٨﴾ وَمِنْ حَيْثُ خَرَجْتَ فَوَلِّ وَجْهَكَ شَطْرَ ٱلْمَسْجِدِ ٱلْحَرَامِ ۖ وَإِنَّهُۥ لَلْحَقُّ مِن رَّبِّكَ ۗ وَمَا ٱللَّهُ بِغَٰفِلٍ عَمَّا تَعْمَلُونَ ﴿١٤٩﴾ وَمِنْ حَيْثُ خَرَجْتَ فَوَلِّ وَجْهَكَ شَطْرَ ٱلْمَسْجِدِ ٱلْحَرَامِ ۚ وَحَيْثُ مَا كُنتُمْ فَوَلُّوا۟ وُجُوهَكُمْ شَطْرَهُۥ لِئَلَّا يَكُونَ لِلنَّاسِ عَلَيْكُمْ حُجَّةٌ إِلَّا ٱلَّذِينَ ظَلَمُوا۟ مِنْهُمْ فَلَا تَخْشَوْهُمْ وَٱخْشَوْنِى وَلِأُتِمَّ نِعْمَتِى عَلَيْكُمْ وَلَعَلَّكُمْ تَهْتَدُونَ ﴿١٥٠﴾ كَمَآ أَرْسَلْنَا فِيكُمْ رَسُولًا مِّنكُمْ يَتْلُوا۟ عَلَيْكُمْ ءَايَٰتِنَا وَيُزَكِّيكُمْ وَيُعَلِّمُكُمُ ٱلْكِتَٰبَ وَٱلْحِكْمَةَ وَيُعَلِّمُكُم مَّا لَمْ تَكُونُوا۟ تَعْلَمُونَ ﴿١٥١﴾ فَٱذْكُرُونِىٓ أَذْكُرْكُمْ وَٱشْكُرُوا۟ لِى وَلَا تَكْفُرُونِ ﴿١٥٢﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱسْتَعِينُوا۟ بِٱلصَّبْرِ وَٱلصَّلَوٰةِ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ مَعَ ٱلصَّٰبِرِينَ ﴿١٥٣﴾

(١٤٦) ئەوانەی کتێبمان پێ بەخشیوون پێغەمبەر ﷺ دەناسن هەروەک چۆن نەوەکانی خۆیان دەناسن، بێگومان دەستەیەک لەوان ئەو راستییە دەشارنەوە، لەکاتێکدا دەشزانن محمد ﷺ فرستادەی خوایە.

(١٤٧) حەق و راستی هەر ئەوەیە لەلایەن پەروەردگارتەوە پێت راگەیەنراوە، نەکەی لە ریزی ئەو کەسانەدا بیت گومان و دوودڵی (بۆ خەڵکی) دروست دەکەن.

(١٤٨) بۆ هەرگەل و میللەتێک روگەو قیبلەیەک هەیە، خوا روویان وەردەچەرخێنێت بۆ لای، (دە ئێوەی موسوڵمان) پێشبڕکێ بکەن لە چاکەکاندا، روو لە هەرکوێ بکەن و لە هەرکوێ بن خوا هەمووتان کۆ دەکاتەوە چونکە بەڕاستی ئەو خوایە بەتوانایە بەسەر هەموو شتێکدا.

(١٤٩) لە هەر شوێنێکەوە دەرچویتە دەرەوە (لە هەرکوێ بوویت لە ماڵ یان سەفەر، لەکاتی نوێژەکاندا) روو بکەرە کەعبەی پیرۆز، بێگومان ئەو فەرمانە حەق و راستیە و لەلایەن پەروەردگارتەوەیە، خوا غافڵ و بێئاگا نیە لەو کاروکردەوانەی کە ئەنجامی دەدەن.

(١٥٠) لە هەر لایەکەوە رۆیشتیتە دەرەوە و لە هەرکوێ بوویت (لەکاتی نوێژەکاندا) روو بکەرە کەعبەی پیرۆز و ئێوەش (ئەی موسوڵمانان) لە هەر کوێ بوون و هەن رووتان وەرچەرخێنن بەلای ئەودا، تاخەڵکی و میللەتانی تر هیچ بەڵگەیەکیان نەبێت بەسەرتانەوە، مەگەر ستەمکارانیان (کە بەهیچ بەڵگەیەک قایل نابن و هەر ئاشووب و پیلان دەگێڕن)، جا لەو تاوانبارو پیلانگێڕانە مەترسن، بەڵکو تەنها لە من بترسن، تا نازو نیعمەتی خۆمتان بەتەواوی بەسەردا برێژم (کە مانەوەیە لەسەر رێگەی راست لە دنیادا و بەهەشتی بەرین و ڕەزامەندی خوایە لە دوارۆژدا) بۆ ئەوەی هەوڵ بدەن بەردەوام رێبازی هیدایەت بگرنەبەر.

(١٥١) هەر وەکو (بۆ تەواو کردنی نازو نیعمەتم) لە نێوتاندا پێغەمبەرێکم لە خۆتان بۆ رەوانە کردوون کە ئایەتەکانی منتان بەسەردا دەخوێنێتەوە، دڵ و دەروون و رواڵەت و ئاشکراتان خاوێن دەکاتەوە، فێری قورئان و حیکمەت و داناییتان دەکات، ئەو شتانەتان فێر دەکات کە هەرگیز خۆتان نەتاندەزانی.

(١٥٢) (دەی کەواتە) ئەی ئیمانداران ئەگەر یادی من بکەن، منیش یادی ئێوە دەکەم و سوپاسگوزاری من بن و سوپاس ناپەزێرو سپڵەیی بەرامبەرم مەکەن.

(١٥٣) ئەی ئەوانەی ئیمان و باوەڕتان هێناوە داوای کۆمەک و یارمەتی لە خوا بکەن بەهۆی ئارامگرتن و نوێژ کردنەوە، دڵنیابن کە خوا یارو یاوەری خۆگرو ئارامگرانە.

وَلَا تَقُولُوا لِمَن يُقْتَلُ فِي سَبِيلِ اللَّهِ أَمْوَاتٌ بَلْ أَحْيَاءٌ وَلَٰكِن لَّا تَشْعُرُونَ ﴿١٥٤﴾ وَلَنَبْلُوَنَّكُم بِشَيْءٍ مِّنَ الْخَوْفِ وَالْجُوعِ وَنَقْصٍ مِّنَ الْأَمْوَالِ وَالْأَنفُسِ وَالثَّمَرَاتِ وَبَشِّرِ الصَّابِرِينَ ﴿١٥٥﴾ الَّذِينَ إِذَا أَصَابَتْهُم مُّصِيبَةٌ قَالُوا إِنَّا لِلَّهِ وَإِنَّا إِلَيْهِ رَاجِعُونَ ﴿١٥٦﴾ أُولَٰئِكَ عَلَيْهِمْ صَلَوَاتٌ مِّن رَّبِّهِمْ وَرَحْمَةٌ وَأُولَٰئِكَ هُمُ الْمُهْتَدُونَ ﴿١٥٧﴾ ۞ إِنَّ الصَّفَا وَالْمَرْوَةَ مِن شَعَائِرِ اللَّهِ فَمَنْ حَجَّ الْبَيْتَ أَوِ اعْتَمَرَ فَلَا جُنَاحَ عَلَيْهِ أَن يَطَّوَّفَ بِهِمَا وَمَن تَطَوَّعَ خَيْرًا فَإِنَّ اللَّهَ شَاكِرٌ عَلِيمٌ ﴿١٥٨﴾ إِنَّ الَّذِينَ يَكْتُمُونَ مَا أَنزَلْنَا مِنَ الْبَيِّنَاتِ وَالْهُدَىٰ مِن بَعْدِ مَا بَيَّنَّاهُ لِلنَّاسِ فِي الْكِتَابِ أُولَٰئِكَ يَلْعَنُهُمُ اللَّهُ وَيَلْعَنُهُمُ اللَّاعِنُونَ ﴿١٥٩﴾ إِلَّا الَّذِينَ تَابُوا وَأَصْلَحُوا وَبَيَّنُوا فَأُولَٰئِكَ أَتُوبُ عَلَيْهِمْ وَأَنَا التَّوَّابُ الرَّحِيمُ ﴿١٦٠﴾ إِنَّ الَّذِينَ كَفَرُوا وَمَاتُوا وَهُمْ كُفَّارٌ أُولَٰئِكَ عَلَيْهِمْ لَعْنَةُ اللَّهِ وَالْمَلَائِكَةِ وَالنَّاسِ أَجْمَعِينَ ﴿١٦١﴾ خَالِدِينَ فِيهَا لَا يُخَفَّفُ عَنْهُمُ الْعَذَابُ وَلَا هُمْ يُنظَرُونَ ﴿١٦٢﴾ وَإِلَٰهُكُمْ إِلَٰهٌ وَاحِدٌ لَّا إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ الرَّحْمَٰنُ الرَّحِيمُ ﴿١٦٣﴾



(١٥٤) جا هەرگیز بەو کەسانەی لە ڕێگەی خوادا دەکوژرێن و شەهید دەبن، مەڵێن: مردوون، نەخێر ئەوانە زیندوون و بەڵام ئێوە هەست بە زیندوویەتی ئەوان ناکەن.

(١٥٥) سوێند بەخوا تاقیتان دەکەینەوە بە کەمێک لە ترس و بیم و برسێتی و کەم بوونی ماڵ و سامان و مردنی کەس و کارو تیاچوونی بەرو بوومی کشتوکاڵ، جا مژدە بدە بەو کەسانەی خۆگرو ئارامگرن...

(١٥٦) کە ئەوانەن هەر کاتێک تووشی بەڵاو ناخۆشیەک دەبن دەڵێن: ئێمە موڵکی خواین و هەرچی هەمانە بەخششی خوایە، سەر ئەنجامیش تەنها هەر بۆ لای ئەو زاتەیە گەڕانەوەمان.

(١٥٧) ئا ئەوانە چەندەها ستایش و ڕەحمەت و میهرەبانی هەر بەسەر ئەواندا دەبارێت لەلایەن پەروەردگاریانەوە و ئەوانە ئەو کەسانەن ڕێبازی هیدایەتیان وەرگرتووە.

(١٥٨) بەڕاستی صەفا و مەروە (کە دوو جێگەن لە پاڵ کەعبەدا) لە دروشمەکانی خوای پەروەردگارن، جا ئەوەی حەجی ماڵی خوا دەکات، یاخود عەمرە ئەنجام دەدات (کە لە هەموو کاتێکی ساڵدا دەکرێت) ئەوە هیچ گوناهێکی لەسەر نییە ئەگەر هاتوچۆو بکات لە نێوانیاندا، ئەوەش خۆبەخشی دەکات و(عەمرە و طواف)ی زیاتر دەکات با بزانێت کە خوا سوپاسگوزارو زانایە.

(١٥٩) بەڕاستی ئەوانەی کە بەرنامە و ڕێنموویەکانی ئاشکرای ڕەوانە کراوی ئێمە دەشارنەوە کە ناردوومانە، دوای ئەوەی بۆ خەڵکیمان روون کردۆتەوە لە کتێبەکاندا، ئا ئەوانە خوا نەفرینیان لێدەکات و نەفرین کارانیش نەفرەتیان لێدەکەن...

(١٦٠) جگە لەوانەی کە تەوبەیان کردووە و چاکسازیان ئەنجامداوەو ئەو حەقیقەت و ڕاستیان روون کردۆتەوە کە جاران شاردبوویانەوە، ئا ئەوانە گەڕانەوەکەیان لێ وەردەگرم و تەنها منیشم زۆر تەوبە وەرگرو دڵۆڤان و میهرەبانم.

(١٦١) بەڕاستی ئەوانەی کە بێ باوەڕ بوون و بە بێ باوەڕی مردوون، ئا ئەوانە لەعنەت و نەفرینی خواو فریشتەکان و هەموو خەڵکیان بەگشتی بەسەردا دادەبارێت...

(١٦٢) ئەوانە بەو نەفرینەوە لە ئاگری دۆزەخدا بۆ هەمیشە دەمێننەوە و ئەو سزایەیان لەسەر سووک ناکرێت و بە چاوی سۆزەوە تەماشا ناکرێن.

(١٦٣) خوای ئێوە خوایەکی تاک و تەنهایە، جگە لەو زاتە خوایەکی تر نیە، هەر ئەو خوایەش بەخشندەو میهرەبان و بەبەزەییە.

إِنَّ فِي خَلْقِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَٱخْتِلَٰفِ ٱلَّيْلِ وَٱلنَّهَارِ وَٱلْفُلْكِ ٱلَّتِي تَجْرِي فِي ٱلْبَحْرِ بِمَا يَنفَعُ ٱلنَّاسَ وَمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مِن مَّآءٍ فَأَحْيَا بِهِ ٱلْأَرْضَ بَعْدَ مَوْتِهَا وَبَثَّ فِيهَا مِن كُلِّ دَآبَّةٍ وَتَصْرِيفِ ٱلرِّيَٰحِ وَٱلسَّحَابِ ٱلْمُسَخَّرِ بَيْنَ ٱلسَّمَآءِ وَٱلْأَرْضِ لَأَيَٰتٍ لِّقَوْمٍ يَعْقِلُونَ ﴿١٦٤﴾ وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يَتَّخِذُ مِن دُونِ ٱللَّهِ أَندَادًا يُحِبُّونَهُمْ كَحُبِّ ٱللَّهِ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ أَشَدُّ حُبًّا لِّلَّهِ وَلَوْ يَرَى ٱلَّذِينَ ظَلَمُوٓا۟ إِذْ يَرَوْنَ ٱلْعَذَابَ أَنَّ ٱلْقُوَّةَ لِلَّهِ جَمِيعًا وَأَنَّ ٱللَّهَ شَدِيدُ ٱلْعَذَابِ ﴿١٦٥﴾ إِذْ تَبَرَّأَ ٱلَّذِينَ ٱتُّبِعُوا۟ مِنَ ٱلَّذِينَ ٱتَّبَعُوا۟ وَرَأَوُا۟ ٱلْعَذَابَ وَتَقَطَّعَتْ بِهِمُ ٱلْأَسْبَابُ ﴿١٦٦﴾ وَقَالَ ٱلَّذِينَ ٱتَّبَعُوا۟ لَوْ أَنَّ لَنَا كَرَّةً فَنَتَبَرَّأَ مِنْهُمْ كَمَا تَبَرَّءُوا۟ مِنَّا كَذَٰلِكَ يُرِيهِمُ ٱللَّهُ أَعْمَٰلَهُمْ حَسَرَٰتٍ عَلَيْهِمْ وَمَا هُم بِخَٰرِجِينَ مِنَ ٱلنَّارِ ﴿١٦٧﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ كُلُوا۟ مِمَّا فِي ٱلْأَرْضِ حَلَٰلًا طَيِّبًا وَلَا تَتَّبِعُوا۟ خُطُوَٰتِ ٱلشَّيْطَٰنِ إِنَّهُۥ لَكُمْ عَدُوٌّ مُّبِينٌ ﴿١٦٨﴾ إِنَّمَا يَأْمُرُكُم بِٱلسُّوٓءِ وَٱلْفَحْشَآءِ وَأَن تَقُولُوا۟ عَلَى ٱللَّهِ مَا لَا تَعْلَمُونَ ﴿١٦٩﴾

(١٦٤) بەڕاستی لە دروستکردنی ئاسمانەکان و زەوی و ئاڵوگۆڕی شەوو ڕۆژدا و لەو کەشتیانەدا کە دەگەڕێن بە دەریادا و بەهۆیەوە سوود بە خەڵکی دەگەیەنن و لەو ئاوەی کە خوا لە ئاسمانەوە دەیبارێنێت و ئینجا بەهۆیەوە زەوی پێ زیندوو دەکاتەوە دوای ووشک بوون و مردنی ، هەروەها جۆرەها زیندەوەر و گیانلەبەر و مارو مێرووی لەسەر رووکاری زەویدا بڵاو کردۆتەوە و گۆڕاندن و هاتووچۆ پێکردنی باو شەماڵ و ڕاگیر کردنی هەورەکان لە نێوان ئاسمان و زەویدا، ئەمانە هەمووی بەڵگەو نیشانەی بەهێزن بۆ ئەوانەی کە عەقڵ و بیروهۆشیان دەخەنەکارو بیر لە دەسەڵاتی بێ سنووری خوا دەکەنەوە.

(١٦٥) (لەگەڵ ئەوهەموو بەڵگە ئاشکرایانەدا) هەندێک کەس هەیە لەجیاتی ئەوەی خواپەرست بێت، شتانی تر دادەتاشێت بۆ خۆی و (شوێن ڕێنموویەکانی خوا ناکەوێت و) خۆشەویستی و سۆزی دەدات بەو بت و بەرنامۆلکەو تولە ڕێگەیانە و خۆشی دەوێن، وەک چۆن ئیمانداران خوایان خۆش دەوێت، بەڵام ئەوانەی ئیمان و باوەڕیان هێناوە زۆر زیاتر خوایان خۆش دەوێت (هەر بەراورد ناکرێت) جا ئەوانەی کە ستەمیان کردووە گەر دەیانزانی لەکاتێکدا کە بەچاوی خۆیان ڕووبەڕووی ئەو سزایە دەبنەوە، کە بەڕاستی بۆیان دەردەکەوێت کە هێزو تواناو دەسەڵات هەر هەمووی بە دەست خوایە و دڵنیا دەبوون کە ئەو خوایە سزاکەی زۆر بە ئازارە (بۆ ستەمکاران).

(١٦٦) لەو کاتەدا سزای ڕۆژی دوایی دەبینن، ئەوانەی کە خەڵکی شوێنیان کەوتبوون خۆیان بەریی دەکەن و لە شوێنکەوتەکانیان حاشا دەکەن، بەتایبەت کاتێک ئەو سزا توندو تیژە دەبینن، هەموو پەیوەندیەکان دەبچڕێت کە لە نێوانیاندا هەبوو و هیچ بەڵگەو بیانویەکیان بەدەستەوە نامێنێت کە خۆیانی پێ ڕزگار بکەن.

(١٦٧) ئەوانەی کە شوێنکەوتە بوون دەڵێن: خۆزگە نۆرەیەکمان بۆ بلوایە ئێمەش ئاوا خۆمان بەریی دەکرد لەوان، هەروەک ئەوان خۆیان بەریی کرد لە ئێمە، ئا بەو شێوەیە خوا سەرئەنجامی کارو کردەوەکانیان نیشان دەدات و بۆیان دەکاتە ئاخ و حەسرەت لەسەریان، بەڕاستی ئەوانە هەرگیز لە دۆزەخ دەرچوونیان نییە.

(١٦٨) ئەی خەڵکینە! لە ڕزق و ڕۆزی حەڵاڵ و پاکی زەوی بخۆن (توخنی قەدەغە کراوەکان مەکەون) و شوێن هەنگاوەکانی شەیتان مەکەون، چونکە بێگومان ئەو دوژمنێکی ئاشکراتانە.

(١٦٩) بێگومان ئەو شەیتانە هەر فەرمان بە خراپە و گوناهو تاوان دەکات و هەروەها هانتان دەدات بۆ وتنی هەندێک شت-یان هەڵبەستنی هەندێک گوفتار بەدەم خواوە بێ ئەوەی بزانن (کە سەرئەنجامی ئەو کارەتان چەندە مەترسیدارە).

وَإِذَا قِيلَ لَهُمُ ٱتَّبِعُوا مَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ قَالُوا بَلْ نَتَّبِعُ مَآ أَلْفَيْنَا عَلَيْهِ ءَابَآءَنَآ ۗ أَوَلَوْ كَانَ ءَابَآؤُهُمْ لَا يَعْقِلُونَ شَيْـًٔا وَلَا يَهْتَدُونَ ﴿١٧٠﴾ وَمَثَلُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا كَمَثَلِ ٱلَّذِى يَنْعِقُ بِمَا لَا يَسْمَعُ إِلَّا دُعَآءً وَنِدَآءً ۚ صُمٌّۢ بُكْمٌ عُمْىٌ فَهُمْ لَا يَعْقِلُونَ ﴿١٧١﴾ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا كُلُوا مِن طَيِّبَـٰتِ مَا رَزَقْنَـٰكُمْ وَٱشْكُرُوا لِلَّهِ إِن كُنتُمْ إِيَّاهُ تَعْبُدُونَ ﴿١٧٢﴾ إِنَّمَا حَرَّمَ عَلَيْكُمُ ٱلْمَيْتَةَ وَٱلدَّمَ وَلَحْمَ ٱلْخِنزِيرِ وَمَآ أُهِلَّ بِهِۦ لِغَيْرِ ٱللَّهِ ۖ فَمَنِ ٱضْطُرَّ غَيْرَ بَاغٍ وَلَا عَادٍ فَلَآ إِثْمَ عَلَيْهِ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿١٧٣﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَكْتُمُونَ مَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ مِنَ ٱلْكِتَـٰبِ وَيَشْتَرُونَ بِهِۦ ثَمَنًا قَلِيلًا ۙ أُولَـٰٓئِكَ مَا يَأْكُلُونَ فِى بُطُونِهِمْ إِلَّا ٱلنَّارَ وَلَا يُكَلِّمُهُمُ ٱللَّهُ يَوْمَ ٱلْقِيَـٰمَةِ وَلَا يُزَكِّيهِمْ وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿١٧٤﴾ أُولَـٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ ٱشْتَرَوُا ٱلضَّلَـٰلَةَ بِٱلْهُدَىٰ وَٱلْعَذَابَ بِٱلْمَغْفِرَةِ ۚ فَمَآ أَصْبَرَهُمْ عَلَى ٱلنَّارِ ﴿١٧٥﴾ ذَٰلِكَ بِأَنَّ ٱللَّهَ نَزَّلَ ٱلْكِتَـٰبَ بِٱلْحَقِّ ۗ وَإِنَّ ٱلَّذِينَ ٱخْتَلَفُوا فِى ٱلْكِتَـٰبِ لَفِى شِقَاقٍۭ بَعِيدٍ ﴿١٧٦﴾

(١٧٠) ئەگەر بەو خەڵکە نادانــە بوترێـت: شـوێنی ئـەو بەرنامەیە بکـەون کـە لەلایـەن خـواوە رەوانـە کراوە، دەڵێن: نەخێر، هەر شوێنی ئەوە دەکەوین کە بـاوو باپیرانمـان پێـوەی ئـالوودە بـوون و لەسـەری راهـاتوون، ئایـا ئەگـەر بـاوو باپیرانیشـیان تـێ نەگەیشـتوو هیـچ نـەزان و ناشـارەزاو رێنموویـیش وەرنەگرن (هەر شوێنیان دەکەون؟!).

(١٧١) نموونـەی بێباوەڕان (لەگـەڵ پێغەمبـەردا لەوەی کە سوود وەرناگرن لـەم قورئانـە) وەکـو ئـەو شوانە وایە: کە هاوار دەکـات بەسـەر ئاژەڵەکـەیدا، بەڵام تێی ناگەن، تەنها ئەوەیە کە گوێیان لە هات و هاوارێکـە، ئەوانـە کـەڕو لاڵ و کوێـرن و ژیـری و هۆشمەندیان لە دەستداوە.

(١٧٢) ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێنـاوە، بخـۆن لـەو رزق و رۆزیە چاک و باشانەی کە پێمان بەخشـیوون و بەردەوام سوپاسـگوزاری خـوا بکـەن ئەگـەر تێـوە تەنها ئەو دەپەرستن.

(١٧٣) (خوای پەروەردگار) تەنها مردارەوە بـوو و خوێن و گۆشتی بەراز و ئـەو ماڵاتانـەی کـە نـاوی غـەیری خوایان لەکاتی سـەربڕیندا لەسـەر هێنـراوە، حەرامی کردووە لێتان، جا ئەگەر کەسێک پێویستی ناچاری کرد بەخواردنیان بێ زیادەڕەوی و لە سنوور دەرچوون، ئەوە هیچ گوناهێکی لەسەرنیيە، بەراستی خوا زۆر لێخۆشبوو بە بەزەیی و دڵۆڤانە.

(١٧٤) بێگومان ئەوانەی نیگای خوا دەشارنەوە کە لە کتێبەکانیدا رەوانەی کردوون (تـەورات و ئینجیـل و قورئـان) و بـەو شاردنەوەیە نرخێکی کەم بەدەست دەهێنن (ئەگەر هەموو دنیاشیان دەسـتکەوێت لـە بەرامبەریـەوە هەرکەمـە)، ئـا ئەوانـە تەنها ئاگر دەخۆن و سکیانی لێ پڕ دەکەن و لە رۆژی قیامەتدا خوای گەورە نایاندوێنێت و خاوێنیـان ناکاتـەوە (لـە چڵک و چەپەڵی گوناهیان) و هەر سزای بەئێشیان بۆ هەیە...

(١٧٥) ئا ئەوانە کەسانێکن کـە گومڕاییـان وەرگرتـووە لـە بـاتی هیدایـەت و سـزایان کڕیـوە لـە بـاتی چاوپۆشـی و لێبووردن، ئای چەندە خۆگرن لەسەر ئاگری دۆزەخ!!

(١٧٦) (ئەو هەڕەشەیە) لەبەر ئەوەیـە بەراسـتی خـوا کتێبـە پیرۆزەکـانی بەحـەق و راسـتی دابـەزاندووە، بێگومـان ئەوانەش کە ناکۆکیان لەسەری هەیەو هەر ڕایان جیاوازە لە بەرامبەر کتێبە ئاسمانیەکانەوە، ئەوانە هـەر لـە کێشـمە کێش و بەربەرەکانیەکی دوور لە ڕاستیدان.



﴿لَّيْسَ الْبِرَّ أَن تُوَلُّوا وُجُوهَكُمْ قِبَلَ الْمَشْرِقِ وَالْمَغْرِبِ وَلَٰكِنَّ
الْبِرَّ مَنْ آمَنَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ وَالْمَلَائِكَةِ وَالْكِتَابِ
وَالنَّبِيِّينَ وَآتَى الْمَالَ عَلَىٰ حُبِّهِ ذَوِي الْقُرْبَىٰ وَالْيَتَامَىٰ
وَالْمَسَاكِينَ وَابْنَ السَّبِيلِ وَالسَّائِلِينَ وَفِي الرِّقَابِ وَأَقَامَ
الصَّلَاةَ وَآتَى الزَّكَاةَ وَالْمُوفُونَ بِعَهْدِهِمْ إِذَا عَاهَدُوا
وَالصَّابِرِينَ فِي الْبَأْسَاءِ وَالضَّرَّاءِ وَحِينَ الْبَأْسِ ۗ أُولَٰئِكَ الَّذِينَ
صَدَقُوا ۖ وَأُولَٰئِكَ هُمُ الْمُتَّقُونَ (١٧٧) يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا كُتِبَ
عَلَيْكُمُ الْقِصَاصُ فِي الْقَتْلَى ۖ الْحُرُّ بِالْحُرِّ وَالْعَبْدُ بِالْعَبْدِ وَالْأُنثَىٰ
بِالْأُنثَىٰ ۚ فَمَنْ عُفِيَ لَهُ مِنْ أَخِيهِ شَيْءٌ فَاتِّبَاعٌ بِالْمَعْرُوفِ وَأَدَاءٌ
إِلَيْهِ بِإِحْسَانٍ ۗ ذَٰلِكَ تَخْفِيفٌ مِّن رَّبِّكُمْ وَرَحْمَةٌ ۗ فَمَنِ اعْتَدَىٰ
بَعْدَ ذَٰلِكَ فَلَهُ عَذَابٌ أَلِيمٌ (١٧٨) وَلَكُمْ فِي الْقِصَاصِ حَيَاةٌ
يَا أُولِي الْأَلْبَابِ لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ (١٧٩) كُتِبَ عَلَيْكُمْ
إِذَا حَضَرَ أَحَدَكُمُ الْمَوْتُ إِن تَرَكَ خَيْرًا الْوَصِيَّةُ لِلْوَالِدَيْنِ
وَالْأَقْرَبِينَ بِالْمَعْرُوفِ ۖ حَقًّا عَلَى الْمُتَّقِينَ (١٨٠) فَمَن بَدَّلَهُ
بَعْدَمَا سَمِعَهُ فَإِنَّمَا إِثْمُهُ عَلَى الَّذِينَ يُبَدِّلُونَهُ ۚ إِنَّ اللَّهَ سَمِيعٌ عَلِيمٌ (١٨١)

(١٧٧) کرداری چاک و کاری باش تەنها بریتی نیە لە رووکردنتان بەرەو رۆژهەلات و رۆژئاوا (چونکە جولەکە زۆر لەسەر گۆڕانی قیبلە دووان و پرو پاگەندەی زۆریان کرد)، بەڵکو کرداری چاک و کاری باش بریتیە لەوەی کە ئادەمیزاد باوەڕی هێنابێت بە خواو بە ڕۆژی دوایی و بە فریشتەکان و بەکتێبەکان و بە پێغەمبەران، هەروەها ماڵ و سامانی بەخشی بێت ـ لەگەڵ خۆشەویستیدا بۆی ـ بەخزمان و هەتیوان و هەژاران و ڕێبواران و داواکاران و لە پێناوی ئازادکردنی بەندەکاندا؛ هەروەها نوێژی بەچاکی ئەنجام دابێت و زەکاتیشی لە ماڵ و سامانی دەرکردبێت و ئەوانەی وەفاداربن بەپەیمانەکانیان کاتێک پەیمانیان دابێت، ئەوانەش کە لەکاتی نەداری و هەژاری و نەخۆشی و ناخۆشی و کاتی جەنگ و شەڕو شۆڕدا ئارامگرن، ئا ئەوانە کەسانێکن ڕاستیان کردووە و هەر ئەوانەشن پارێزکارو خواناس و دیندارن.

(١٧٨) ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە، پێویست کراوە لەسەرتان: تۆڵەسەندنەوە بۆ کوژراوەکان، کەسێکی ئازاد بەکەسێکی ئازاد و بەندەش لە جیاتی بەندە و ئافرەت لە جیاتی ئافرەت (واتە هەر کەسێک بە تاوانی کوشتنی ناحەق هەستا دەبێت بکوژرێتەوە)، جا ئەوەی چاوپۆشی شتێکی لێکرا لەلایەن براکەیەوە، با حەقداری کوژراوەکە چاک ڕەفتاربێت لەگەڵ بکوژەکەداو بکوژەکە بەجوانی خوێن بەهای کوژراوەکە بدات و ئەوە کار ئاسانکردن و سۆزو میهرەبانیەکە لە لایەن پەروەردگارتانەوە (کە لە جیاتی کوشتنەوە خوێنبایی وەربگیرێت) ئەوسا ئیتر ئەوەی لەوەودوا دەستدرێژی بکات و لە سنوور بترازێت سزای بەئێشی بۆ ئامادەکراوە.

(١٧٩) ئەی هۆشمەندەکان ژیانتان تەنها لە تۆڵەسەندنەوەدایە (لەو کەسانەی خەڵکی بەناحەق دەکوژن)، بۆ ئەوەی تەقواو لە خوا ترسان ببێتە پیشەتان و خۆ لە دەستدرێژی و تاوان بە دوور بگرن.

(١٨٠) پێویستکراوە لەسەرتان کاتێک یەکێکتان مەرگی نزیک بووەوە سامان و ماڵ و دارایییەکی بەجێ دەهێشت، با وەسیەت بکات کە هەندێکی بدرێت بە دایک و باوکی و خزمانی بەشێوەیەکی جوان و لەبارو ئەمە پێویست و ئەرکە لەسەر خواناس و پارێزکاران.

(١٨١) جا ئەوەی ئەو وەسیەتە دەگۆڕێت دوای ئەوەی بیستی و بەباشی وەری گرت، گوناهی تەنها لەسەر ئەوانەیە کە دەیگۆڕن، بەڕاستی خوای پەروەردگار بیسەرو زانایە (بە گوفتار و نیەتیان).

فَمَنْ خَافَ مِن مُّوصٍ جَنَفًا أَوْ إِثْمًا فَأَصْلَحَ بَيْنَهُمْ فَلَا إِثْمَ عَلَيْهِ ۚ إِنَّ اللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿١٨٢﴾ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا كُتِبَ عَلَيْكُمُ الصِّيَامُ كَمَا كُتِبَ عَلَى الَّذِينَ مِن قَبْلِكُمْ لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ ﴿١٨٣﴾ أَيَّامًا مَّعْدُودَاتٍ ۚ فَمَن كَانَ مِنكُم مَّرِيضًا أَوْ عَلَىٰ سَفَرٍ فَعِدَّةٌ مِّنْ أَيَّامٍ أُخَرَ ۚ وَعَلَى الَّذِينَ يُطِيقُونَهُ فِدْيَةٌ طَعَامُ مِسْكِينٍ ۖ فَمَن تَطَوَّعَ خَيْرًا فَهُوَ خَيْرٌ لَّهُ ۚ وَأَن تَصُومُوا خَيْرٌ لَّكُمْ ۖ إِن كُنتُمْ تَعْلَمُونَ ﴿١٨٤﴾ شَهْرُ رَمَضَانَ الَّذِي أُنزِلَ فِيهِ الْقُرْآنُ هُدًى لِّلنَّاسِ وَبَيِّنَاتٍ مِّنَ الْهُدَىٰ وَالْفُرْقَانِ ۚ فَمَن شَهِدَ مِنكُمُ الشَّهْرَ فَلْيَصُمْهُ ۖ وَمَن كَانَ مَرِيضًا أَوْ عَلَىٰ سَفَرٍ فَعِدَّةٌ مِّنْ أَيَّامٍ أُخَرَ ۗ يُرِيدُ اللَّهُ بِكُمُ الْيُسْرَ وَلَا يُرِيدُ بِكُمُ الْعُسْرَ وَلِتُكْمِلُوا الْعِدَّةَ وَلِتُكَبِّرُوا اللَّهَ عَلَىٰ مَا هَدَاكُمْ وَلَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ ﴿١٨٥﴾ وَإِذَا سَأَلَكَ عِبَادِي عَنِّي فَإِنِّي قَرِيبٌ ۖ أُجِيبُ دَعْوَةَ الدَّاعِ إِذَا دَعَانِ ۖ فَلْيَسْتَجِيبُوا لِي وَلْيُؤْمِنُوا بِي لَعَلَّهُمْ يَرْشُدُونَ ﴿١٨٦﴾

(١٨٢) جا هەر کەس دەترسا لە وەسیەت کارەکە هەڵە یان گوناهێک یان ساف خۆرییەکی ئەنجام بدات (گیروگرفت بۆ وەرەسە دروست بکات) ئینجا رێکی خستن، ئەوە هیچ گوناهی لەسەرنیە (بەڵکو بەخێرخواز لە قەڵەم دەدرێت) بەڕاستی خوا زۆر لێخۆشبوو میهرەبانە.

(١٨٣) ئەی ئەو کەسانەی باوەڕتان هێناوە ڕۆژووی ڕەمەزان لەسەرتان پێویست کراوە هەر وەکو لەسەر گەلانی پێش ئێوە پێویست کرابوو، بۆ ئەوەی خواناسی و پارێزکاری بکەن.

(١٨٤) چەند ڕۆژێکی ژمێرراوی دیاریکراو (کە مانگی ڕەمەزانە) خۆ ئەگەر کەسێک لە ئێوە نەخۆش بوو یان لە سەفەردا بوو با بە ئەندازەی ئەو ڕۆژانەی بۆی نەگیراوە لە ڕۆژانێکی تردا بیانگرێتەوەو ئەوانەش کە بە زەحمەت دەتوانن بەڕۆژوو بن (وەکو پیرەمێردو نەخۆشە بەردەوامەکان) ئەوە با ژەمێک خواردن ببەخشن بە هەژارێک، ئەوەی زیاتر ببەخشێت ئەوە باشترە بۆی، بێگومان ئەگەر بەڕۆژوو بن چاکترەو پاداشتی زۆرترە ئەگەر بزانن و (بتوانن).

(١٨٥) مانگی ڕەمەزان (ئەو مانگەیە) کە قورئانی تیادا هاتۆتە خوارەوە، لەکاتێکدا ئەم قورئانە ڕێنموویی بەخشە بە خەڵکی و بەڵگەی زۆری تیادایە، لە ڕێنموویی و جیاکردنەوەی ڕاست و ناڕاست و حەق و ناحەق، جا کەسێک لە ئێوە مانگی ڕەمەزانی بینی (یان هەواڵی بینینی پێدرا)، دەبا ئەو مانگە بەڕۆژوو بێت، ئەوەش کە نەخۆش بێت یان لە سەفەردا بێت با لە ڕۆژانی تردا بەو ئەندازە بیگرێتەوە، چونکە خوا ئاسانکاری بۆ ئێوە دەوێت و نایەوێت (پەرستن و فەرزەکانتان) لەسەر قورس و گران بکات و بۆ ئەوەی ئەو ماوە دیاریکراوە تەواو بکەن و خوا بەگەورە بگرن و سوپاسگوزاریشی بکەن لەسەر ئەوەی کە ڕێنموویی کردوون (سروودی جەژن: الله اکبر الله اکبر الله اکبر، لا اله الا الله والله اکبر، الله اکبر ولله الحمد، بەجێهێنانی ئەم فەرمانە خواییەیە).

(١٨٦) (ئەی محمد ﷺ) ئەگەر بەندەکانم پرسیارت لێبکەن دەربارەم، ئەوە من نزیکم لێیانەوە، بە هاناو هاواری دۆعا گۆیانەوە دەچم هەر کاتێک لێم بپاڕێنەوەو نزا بکەن، دەبا ئەوانیش بەدەم بانگەوازی منەوە بێن و باوەڕی دامەزراو بە من بهێنن، بۆ ئەوەی ڕێگای هوشیاری و ئاگایی بگرنەبەر (بۆ بەدەستهێنانی سەربەرزی و سەرفرازی هەردوو جیهان).

أُحِلَّ لَكُمْ لَيْلَةَ الصِّيَامِ الرَّفَثُ إِلَى نِسَآئِكُمْ هُنَّ لِبَاسٌ لَّكُمْ وَأَنتُمْ لِبَاسٌ لَّهُنَّ عَلِمَ اللَّهُ أَنَّكُمْ كُنتُمْ تَخْتَانُونَ أَنفُسَكُمْ فَتَابَ عَلَيْكُمْ وَعَفَا عَنكُمْ فَالْئَانَ بَٰشِرُوهُنَّ وَابْتَغُوا مَا كَتَبَ اللَّهُ لَكُمْ وَكُلُوا وَاشْرَبُوا حَتَّىٰ يَتَبَيَّنَ لَكُمُ الْخَيْطُ الْأَبْيَضُ مِنَ الْخَيْطِ الْأَسْوَدِ مِنَ الْفَجْرِ ثُمَّ أَتِمُّوا الصِّيَامَ إِلَى الَّيْلِ وَلَا تُبَٰشِرُوهُنَّ وَأَنتُمْ عَٰكِفُونَ فِي الْمَسَٰجِدِ تِلْكَ حُدُودُ اللَّهِ فَلَا تَقْرَبُوهَا كَذَٰلِكَ يُبَيِّنُ اللَّهُ ءَايَٰتِهِۦ لِلنَّاسِ لَعَلَّهُمْ يَتَّقُونَ ﴿١٨٧﴾ وَلَا تَأْكُلُوا أَمْوَٰلَكُم بَيْنَكُم بِالْبَٰطِلِ وَتُدْلُوا بِهَا إِلَى الْحُكَّامِ لِتَأْكُلُوا فَرِيقًا مِّنْ أَمْوَٰلِ النَّاسِ بِالْإِثْمِ وَأَنتُمْ تَعْلَمُونَ ﴿١٨٨﴾ ۞ يَسْـَٔلُونَكَ عَنِ الْأَهِلَّةِ قُلْ هِيَ مَوَٰقِيتُ لِلنَّاسِ وَالْحَجِّ وَلَيْسَ الْبِرُّ بِأَن تَأْتُوا الْبُيُوتَ مِن ظُهُورِهَا وَلَٰكِنَّ الْبِرَّ مَنِ اتَّقَىٰ وَأْتُوا الْبُيُوتَ مِنْ أَبْوَٰبِهَا وَاتَّقُوا اللَّهَ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ ﴿١٨٩﴾ وَقَٰتِلُوا فِي سَبِيلِ اللَّهِ الَّذِينَ يُقَٰتِلُونَكُمْ وَلَا تَعْتَدُوا إِنَّ اللَّهَ لَا يُحِبُّ الْمُعْتَدِينَ ﴿١٩٠﴾



(١٨٧) لە شەوگاری رەمەزاندا تێکەڵ بوونتان لەگەڵ هاوسەرانتاندا حەلاڵکراوە، ئەوان پۆشاکن بۆ ئێوە و ئێوەش پۆشاکن بۆ ئەوان، خوای گەورە دەیزانی کە ئێوە خۆتان دەخەڵەتاند (لە نزیک بوونەوەتان لە هاوسەرەکانتانەوە، چونکە دوودڵ بوون و نەتاندەزانی حەلاڵە یان نا)، بەلام خوای میهرەبان تۆبەی لێ وەرگرتن و لێتان خۆشبوو، کەوابوو لە ئێستە بەدواوە (لە شەوگاردا) نزیکییان بکەن و ئەوە داوابکەن خوا بۆی بڕیار داون (لە نەوەی چاك و خواناس)، دەبخۆن و بخۆنەوە هەتا بە روونی بەرەبەیان و سپێدەتان بۆ دەردەکەوێت و لە رۆژهەڵاتەوە دیاردەدات و تاریکی شەو لادەبات، لەوەودوا رۆژووەکەتان ببەنە سەر تا شەو دادێت و(خۆرئاوا دەبێت) و نزیکیی لەگەڵ هاوسەرەکانتاندا مەکەن لە کاتێکدا کە ئێوە بڕیاری مانەوەتان (بۆ خوا پەرستی) لە مزگەوتەکاندا داوە، جا ئەوانەی کە باسکران چەند سنوورێکی خوان و مەیانبەزێنن و نزیکیان مەکەون، ئا بەوشێوەیە خوا ئایەت و رێنمووییەکانی خۆی روون دەکاتەوە بۆ خەڵکی بۆ ئەوەی پارێزکاری بکەن.

(١٨٨) نەکەن ماڵ و دارایی یەکتر لە نێوانتاندا بە ناحەق بخۆن (وەك بەرتیل و سوو، یان داگیرکردن و فرۆفێڵ...) نەکەن هەندێکی بدەن بەکاربەدەستان بۆ ئەوەی هەندێك ماڵی خەڵکی بخۆن لە رێگەی ناحەق و گوناهەوە، لە کاتێکدا خۆشتان دەزانن کە ئەوکارە رەوا نیە.

(١٨٩) پرسیارت لێدەکەن دەربارەی نوێ بوونەوەی مانگەکان، پێیان بڵێ ئەوە بۆ دیاریکردنی کاتەکانە بۆ خەڵکی و بۆ زانینی کاتی حەج (خوای گەورە رێکی خستووە)، چاکە و چاکەکاریش ئەوە نیە کە لە پشتەوە خۆتان بکەن بە ماڵاندا (کە ئەمە کارێك بوو لە سەردەمی نەفامیدا ئەنجام دەدرا دوای گەڕانەوە لە حەج) بەڵکو چاکە ئەوەیە کە ئەو کەسە لە خواترس و پارێزکار بێت، لە دەرگای ماڵەکانەوە بچنە ژوورەوە، لە خوا بترسن بۆ ئەوەی سەرفراز بن.

(١٩٠) بجەنگن لە پێناوی رێبازی خوادا دژی ئەوانەی کە دژتان دەجەنگن، نەکەن دەستدرێژی بکەن (دژی ژن و منداڵ و ماڵات و...هتد) چونکە بەڕاستی خوا ئەو دەستدرێژکەرانەی خۆش ناوێت.

وَٱقْتُلُوهُمْ حَيْثُ ثَقِفْتُمُوهُمْ وَأَخْرِجُوهُم مِّنْ حَيْثُ أَخْرَجُوكُمْ ۚ وَٱلْفِتْنَةُ أَشَدُّ مِنَ ٱلْقَتْلِ ۚ وَلَا تُقَٰتِلُوهُمْ عِندَ ٱلْمَسْجِدِ ٱلْحَرَامِ حَتَّىٰ يُقَٰتِلُوكُمْ فِيهِ ۖ فَإِن قَٰتَلُوكُمْ فَٱقْتُلُوهُمْ ۗ كَذَٰلِكَ جَزَآءُ ٱلْكَٰفِرِينَ ﴿١٩١﴾ فَإِنِ ٱنتَهَوْا۟ فَإِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿١٩٢﴾ وَقَٰتِلُوهُمْ حَتَّىٰ لَا تَكُونَ فِتْنَةٌ وَيَكُونَ ٱلدِّينُ لِلَّهِ ۖ فَإِنِ ٱنتَهَوْا۟ فَلَا عُدْوَٰنَ إِلَّا عَلَى ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿١٩٣﴾ ٱلشَّهْرُ ٱلْحَرَامُ بِٱلشَّهْرِ ٱلْحَرَامِ وَٱلْحُرُمَٰتُ قِصَاصٌ ۚ فَمَنِ ٱعْتَدَىٰ عَلَيْكُمْ فَٱعْتَدُوا۟ عَلَيْهِ بِمِثْلِ مَا ٱعْتَدَىٰ عَلَيْكُمْ ۚ وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَٱعْلَمُوٓا۟ أَنَّ ٱللَّهَ مَعَ ٱلْمُتَّقِينَ ﴿١٩٤﴾ وَأَنفِقُوا۟ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ وَلَا تُلْقُوا۟ بِأَيْدِيكُمْ إِلَى ٱلتَّهْلُكَةِ ۛ وَأَحْسِنُوٓا۟ ۛ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلْمُحْسِنِينَ ﴿١٩٥﴾ وَأَتِمُّوا۟ ٱلْحَجَّ وَٱلْعُمْرَةَ لِلَّهِ ۚ فَإِنْ أُحْصِرْتُمْ فَمَا ٱسْتَيْسَرَ مِنَ ٱلْهَدْىِ ۖ وَلَا تَحْلِقُوا۟ رُءُوسَكُمْ حَتَّىٰ يَبْلُغَ ٱلْهَدْىُ مَحِلَّهُۥ ۚ فَمَن كَانَ مِنكُم مَّرِيضًا أَوْ بِهِۦٓ أَذًى مِّن رَّأْسِهِۦ فَفِدْيَةٌ مِّن صِيَامٍ أَوْ صَدَقَةٍ أَوْ نُسُكٍ ۚ فَإِذَآ أَمِنتُمْ فَمَن تَمَتَّعَ بِٱلْعُمْرَةِ إِلَى ٱلْحَجِّ فَمَا ٱسْتَيْسَرَ مِنَ ٱلْهَدْىِ ۚ فَمَن لَّمْ يَجِدْ فَصِيَامُ ثَلَٰثَةِ أَيَّامٍ فِى ٱلْحَجِّ وَسَبْعَةٍ إِذَا رَجَعْتُمْ ۗ تِلْكَ عَشَرَةٌ كَامِلَةٌ ۗ ذَٰلِكَ لِمَن لَّمْ يَكُنْ أَهْلُهُۥ حَاضِرِى ٱلْمَسْجِدِ ٱلْحَرَامِ ۚ وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَٱعْلَمُوٓا۟ أَنَّ ٱللَّهَ شَدِيدُ ٱلْعِقَابِ ﴿١٩٦﴾

(١٩١) (دەستدرێژکەران) بکوژن لە هەر کوێدا دەستان کەوتن و دەستان بەسەریاندا ڕۆیشت و دەریان بکەن لەو شوێنەی کە دەریان کردوون (کە شاری مەککە بوو)، بێگومان هاوەڵگەری و زۆرکردن لە ئیماندار تا پاشگەز ببێتەوە لە ئاینەکەی لە کوشتن خراپترە، مەجەنگن دژی کافران لە سنووری مزگەوتی حەرام و (کەعبە)دا هەتا ئەوان شەڕتان پێ نەفرۆشن و نە جەنگن دژتان، خۆ ئەگەر شەڕیان پێ فرۆشتن وجەنگان دژتان ئێوەش بجەنگن دژیان، چونکە هەر ئاوایە پاداشتی ئەو بێباوەڕانە.

(١٩٢) خۆ ئەگەر ئەوانە کۆڵیانداو شەڕیان وەستان، ئەوە خوا زۆر لێبووردە و میهرەبانە.

(١٩٣) (خۆ ئەگەر کافران کۆڵیان نەداو هەر جەنگان و پیلانیان گێڕا) ئێوەش بجەنگن دژیان تا وەکو هاوەڵگەری و ئاشوب و ناخۆشی نەمێنێت، هەروەها تا دین و ئاین و بەرنامەو فەرمانڕەوایی هەر بۆ خوای گەورە بێت، خۆ ئەگەر کۆڵیانداو وازیان هێنا، ئەوا هیچ جۆرە دژایەتیەکیان نامێنێت تەنها دژ بە ستەمکارەکانیان نەبێت.

(١٩٤) ڕێزی مانگی حەرام پەیوەستە بە ڕێز گرتنی ئەوان بۆ مانگی حەرام (واتە: ئەگەر لەو مانگانەدا جەنگان دژتان کە جەنگ تیایدا حەرامە ئێوە حەقی بەرگریتان هەیە) و دەستدرێژی بۆ سەر هەر شتێکی حورمەتدار دەبێت تۆڵەی بسەنرێت بەبێ زیادەڕەوی، جا ئەوەی کە دەستدرێژی دەکاتە سەرتان، ئێوەش مافتان هەیە بەقەدەر دەست درێژییەکەی ئەو، تۆڵەی خۆتان بکەنەوە و لە خوا بترسن و، چاک بزانن کە بەڕاستی خوا یارو یاوەری پارێزکارانە.

(١٩٥) لە ڕێ و ڕێبازی خواداو بۆ ڕەزامەندی ئەو، ماڵ و سامانتان ببەخشن، بەدەستی خۆتان، خۆتان بەرەو تیاچوون مەبەن (چونکە ڕەزیلی و دەست نوقاوی مایەی تیاچوونە)، هەمیشە خێرو چاکە ئەنجام بدەن و چاکەخواز بن و (ماڵ و سامانتان لە پێناوی خوادا ببەخشن) چونکە بەڕاستی خوا ئەو چاکە کارانەی خۆشدەوێت.

(١٩٦) حەج و عەمرە بەچاکی و تەواوی بۆ بەدەستهێنانی ڕەزامەندی خوا ئەنجام بدەن، جا ئەگەر ڕێتان لێگیراو ئەرکەکانتان بۆ ئەنجام نەدرا (بەهۆی نەخۆشی یان هەر هۆیەکی‌تر) ئەوە دەتوانن ماڵاتێک بکەن بەقوربانی بەگوێرەی توانا، سەرتان مەتاشن و (ئیحرام مەشکێنن) تا قوربانییەکە ئەنجام نەدرێت و بەجێی خۆی نەگات، جا هەر کەسێکتان نەخۆش بوو یان برین و ئازارێک لە سەریدا هەبوو (پێویست بوو مووی سەری یان هەندێکی لابدات) با فیدیە بدات (کە بریتیە لەوەی) بەڕۆژوو بێت، یان خێرێک یان قوربانیەک بکات، جا هەرکاتێک کە لە ئاسوودەیی و ئاسایدا بوون، ئەوەی کە دەیەوێت ئێوان حەج و عەمرە (ئیحرام بشکێنێت و پۆشاکی ئاسایی لەبەر بکات) دەبێت بە گوێرەی توانای خۆی قوربانییەک بکات، ئەوەش کە نەیبوو قوربانی بکات، با سێ ڕۆژ لە حەج بەڕۆژوو بێت و حەوت ڕۆژیش کە گەڕانەوە (ناو ماڵ و حاڵی خۆیان) ئەوە دەکاتە، دە، ڕۆژی تەواو، جا ئەمە بۆ ئەو کەسانەیە کە خەڵکی مەککەو دەورو بەری نین، لە خوا بترسن و پارێزکاربن و بزانن کە بەڕاستی خوا سزاو تۆڵەی زۆر سەختە (لەوانەی کە سەرپێچی دەکەن).

ٱلْحَجُّ أَشْهُرٌ مَّعْلُومَٰتٌ ۚ فَمَن فَرَضَ فِيهِنَّ ٱلْحَجَّ فَلَا رَفَثَ وَلَا فُسُوقَ وَلَا جِدَالَ فِى ٱلْحَجِّ ۗ وَمَا تَفْعَلُوا۟ مِنْ خَيْرٍ يَعْلَمْهُ ٱللَّهُ ۗ وَتَزَوَّدُوا۟ فَإِنَّ خَيْرَ ٱلزَّادِ ٱلتَّقْوَىٰ ۚ وَٱتَّقُونِ يَٰٓأُو۟لِى ٱلْأَلْبَٰبِ ﴿١٩٧﴾ لَيْسَ عَلَيْكُمْ جُنَاحٌ أَن تَبْتَغُوا۟ فَضْلًا مِّن رَّبِّكُمْ ۚ فَإِذَآ أَفَضْتُم مِّنْ عَرَفَٰتٍ فَٱذْكُرُوا۟ ٱللَّهَ عِندَ ٱلْمَشْعَرِ ٱلْحَرَامِ ۖ وَٱذْكُرُوهُ كَمَا هَدَىٰكُمْ وَإِن كُنتُم مِّن قَبْلِهِۦ لَمِنَ ٱلضَّآلِّينَ ﴿١٩٨﴾ ثُمَّ أَفِيضُوا۟ مِنْ حَيْثُ أَفَاضَ ٱلنَّاسُ وَٱسْتَغْفِرُوا۟ ٱللَّهَ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿١٩٩﴾ فَإِذَا قَضَيْتُم مَّنَٰسِكَكُمْ فَٱذْكُرُوا۟ ٱللَّهَ كَذِكْرِكُمْ ءَابَآءَكُمْ أَوْ أَشَدَّ ذِكْرًا ۗ فَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يَقُولُ رَبَّنَآ ءَاتِنَا فِى ٱلدُّنْيَا وَمَا لَهُۥ فِى ٱلْءَاخِرَةِ مِنْ خَلَٰقٍ ﴿٢٠٠﴾ وَمِنْهُم مَّن يَقُولُ رَبَّنَآ ءَاتِنَا فِى ٱلدُّنْيَا حَسَنَةً وَفِى ٱلْءَاخِرَةِ حَسَنَةً وَقِنَا عَذَابَ ٱلنَّارِ ﴿٢٠١﴾ أُو۟لَٰٓئِكَ لَهُمْ نَصِيبٌ مِّمَّا كَسَبُوا۟ ۚ وَٱللَّهُ سَرِيعُ ٱلْحِسَابِ ﴿٢٠٢﴾

(١٩٧) حەج لەچەند مانگێکی دیاریکراودایە و (خۆی بۆ ئامادە دەکرێت و نیەتی لێدەهێنرێت) جا ئەوەی کە لەو مانگانەدا دەستبەکار بوو و بڕیاریدا حەج بکات، ئەوە دەبێت نزیکی هاوسەری نەکەوێت و شەڕە چەپۆک و گوناهو موجادەلە و گوفتاری نادروست ئەنجام نەدات، بێگومان هەر خێرو چاکەیەک ئەنجام بدەن خوا پێی دەزانێت و ئاگادارە لێی، بەردەوام هەوڵ بدەن کە زەخیرەو توێشوو بخەن، بێگومان چاکترین زەخیرەش تەقواو پارێزکاریە، بەردەوامیش لە من بترسن ئەی خاوەن بیرو هۆشەکان.

(١٩٨) هیچ گوناهبار نابن ئەگەر لەکاتی حەجدا لە فەزڵی پەروەردگارتان، خۆتان بەهرەوەر بکەن (وەک بازرگانی و شت کڕین) هەر کاتێک لە عەرەفات دابەزین وگەڕانەوە، یادی خوا بکەن لە لای (مشعر الحرام کە: کێوێکە لە داوێنی مزدلفة دا) و یادیشی بکەن وەک چۆن ڕێنموویی کردوون و هیدایەتی داوون، چونکە بەڕاستی ئێوە پێش ئەم ئاین و ڕێنوومایيە سەرگەردان و گومڕا بوون.

(١٩٩) لەوەودوا (روو بە قورەیش و سەرکردە و دەوڵەمەندان دەفەرموێت): خەڵکی لە کوێوە دابەزین وگەڕانەوە ئێوەش لەوێوە دابەزن و بگەڕێنەوەو (خۆتان جیامەکەنەوە) و داوای لێخۆشبوون لە خوا بکەن، چونکە بەڕاستی پەروەردگارتان زۆر لێخۆشبوو میهرەبانە.

(٢٠٠) جاهەر کاتێک ئەرک و مەناسیکەکانتان بەجێ هێنا، ئەوکاتە یادی خوا بکەن هەروەکو چۆن یادی باو و باپیرانتان دەکەن (کاتی خۆی عەرەب زۆر خۆیان هەڵکێشاوە بە باوو باپیریانەوەو باسیان کردوون) یاخود زۆر زیاتریش لەوان، جا هەندێک لە خەڵکی هەیە کە دەڵێت: پەروەردگارا هەرچیمان پێ دەبەخشیت لە دنیادا پێمان ببەخشە، بێگومان ئەو جۆرە کەسە لە قیامەتدا بێ بەهرەو بێبەش و بێ ڕێزە.

(٢٠١) هەشیانە کە دەڵێت: پەروەردگارا لە دنیادا خێرو چاکەو نازو نیعمەتمان پێ ببەخشەو، لە قیامەتیشدا لە نازو نیعمەتەکانی بەهەشت بەهرەمەندمان بکەو، لە سزای ئاگری دۆزەخ بمانپارێزە.

(٢٠٢) ئا ئەوانە لە هەندێک لەو کارو کردەوانەی کە ئەنجامیانداوە بەهرەوەر دەبن لە دنیاو قیامەتدا و خوا زۆر بەخێرایی لێپرسینەوە ئەنجام دەدات (هەرکەسە بەو شوێنە دەگەیەنێت کە لە دنیادا دەست پێشخەری بۆ کردووە).



﴿ وَٱذۡكُرُواْ ٱللَّهَ فِيٓ أَيَّامٖ مَّعۡدُودَٰتٖۚ فَمَن تَعَجَّلَ فِي يَوۡمَيۡنِ فَلَآ إِثۡمَ عَلَيۡهِ وَمَن تَأَخَّرَ فَلَآ إِثۡمَ عَلَيۡهِۖ لِمَنِ ٱتَّقَىٰۗ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَٱعۡلَمُوٓاْ أَنَّكُمۡ إِلَيۡهِ تُحۡشَرُونَ ﴿٢٠٣﴾ وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يُعۡجِبُكَ قَوۡلُهُۥ فِي ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا وَيُشۡهِدُ ٱللَّهَ عَلَىٰ مَا فِي قَلۡبِهِۦ وَهُوَ أَلَدُّ ٱلۡخِصَامِ ﴿٢٠٤﴾ وَإِذَا تَوَلَّىٰ سَعَىٰ فِي ٱلۡأَرۡضِ لِيُفۡسِدَ فِيهَا وَيُهۡلِكَ ٱلۡحَرۡثَ وَٱلنَّسۡلَۚ وَٱللَّهُ لَا يُحِبُّ ٱلۡفَسَادَ ﴿٢٠٥﴾ وَإِذَا قِيلَ لَهُ ٱتَّقِ ٱللَّهَ أَخَذَتۡهُ ٱلۡعِزَّةُ بِٱلۡإِثۡمِۚ فَحَسۡبُهُۥ جَهَنَّمُۖ وَلَبِئۡسَ ٱلۡمِهَادُ ﴿٢٠٦﴾ وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يَشۡرِي نَفۡسَهُ ٱبۡتِغَآءَ مَرۡضَاتِ ٱللَّهِۚ وَٱللَّهُ رَءُوفُۢ بِٱلۡعِبَادِ ﴿٢٠٧﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱدۡخُلُواْ فِي ٱلسِّلۡمِ كَآفَّةٗ وَلَا تَتَّبِعُواْ خُطُوَٰتِ ٱلشَّيۡطَٰنِۚ إِنَّهُۥ لَكُمۡ عَدُوّٞ مُّبِينٞ ﴿٢٠٨﴾ فَإِن زَلَلۡتُم مِّنۢ بَعۡدِ مَا جَآءَتۡكُمُ ٱلۡبَيِّنَٰتُ فَٱعۡلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ عَزِيزٌ حَكِيمٌ ﴿٢٠٩﴾ هَلۡ يَنظُرُونَ إِلَّآ أَن يَأۡتِيَهُمُ ٱللَّهُ فِي ظُلَلٖ مِّنَ ٱلۡغَمَامِ وَٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ وَقُضِيَ ٱلۡأَمۡرُۚ وَإِلَى ٱللَّهِ تُرۡجَعُ ٱلۡأُمُورُ ﴿٢١٠﴾

(٢٠٣) لە ڕۆژانێکی دیاریکراودا (کە ڕۆژانی جەژنی قوربانە) یادی خوا بکەن ئەوەی کە پەلە بکات و لە دوو ڕۆژدا شەیتان ڕەجم بکات ئەوە هیچ گوناهی لەسەرنییە، ئەوەش دوای بخات و(بە سێ ڕۆژ ئەنجامی بدات) هەرگوناهی لەسەر نییە، بەتایبەت بۆ ئەوانەی کە خۆیان لە نافەرمانی خوا دەپارێزن، جا لە خوا بترسن و بزانن سەرئەنجام ئێوە بۆ لای ئەو دەگەڕێنەوە، (لەبەردەم دادگای ئەودا) کۆ دەکرێنەوە.

(٢٠٤) هەندێ کەس هەن قسەو گوفتارو دەم پاراوییان لە بارەی ژیانی ئەم دنیایەوە سەرسامت دەکات، خوایش بە شایەت دەگرێت و دەڵێت: دڵ و زمانم یەکسانن، لە کاتێکدا ئەو سەرسەختترین کەسە لە هەموو جۆرە دوژمنایەتیەکدا.

(٢٠٥) هەر کاتێک ئەو جۆرە کەسە پشتی هەڵکردو دەسەڵاتی پەیدا کرد؛ هەوڵ و کۆشش دەدات لە زەویدا تا ئاشوب بەرپا بکات و خراپە بڕوێنێت و کشتوکاڵ لەناو ببات و پاکتاو کردنی ڕەگەزی ئەنجام بدات، بێگومان خوا فەسادو خراپە و تاوانی ناوێت.

(٢٠٦) خۆ ئەگەر پێی بوترێت: لە خوا بترسە، (هەروا بۆت نالوێت)، غەرووری دەیگرێت و شانازیی بە گوناهو تاوانەوە دەکات و سوور دەبێت لەسەری، تۆڵە لە ئیماندارە دڵسۆزەکە دەسێنێت و تاوانباریشی دەکات، جا ئەو خوانەناسە دۆزەخی بەسە، سوێند بەخوا ئەو دۆزەخە شوێن و جێگەو لانکەیەکی نالەبارە.

(٢٠٧) هەندێ خەڵکیش هەن (پێچەوانەی ئەوانەی باسکران) خۆیان دەفرۆشن بۆ بەدەستهێنانی ڕەزامەندی بەخوا، خوای گەورەش بەسۆزو میهرەبانە بەرامبەر ئەو جۆرە بەندانەی.

(٢٠٨) ئەی ئەوانەی ئیمان و باوەڕتان هێناوە هەر هەمووتان خۆتان بخەنە ژێرسایەی ئیسلامەوە و بە تەواوی پەیڕەوی بکەن و شوێنی هەنگاوەکانی شەیتان مەکەون، چونکە بەڕاستی ئەو دوژمنی ئاشکراتانە (هەمیشە دەیەوێت شەڕو جەنگ لە نێوان خەڵکیدا بەرپا بکات و لە ئیسلام دووریان بخاتەوە).

(٢٠٩) خۆ ئەگەر لاتانداو هەڵەو گوناهتان کرد دوای ئەوەی کە هەموو شتێکتان بۆ ڕوون کرابۆوە، ئەوە چاک بزانن کە خوا بەدەسەڵاتە (تۆڵەتان لێ بسێنێت)و دانایە (پەلە ناکات بەڵکو بگەڕێنەوە بۆ سەر ڕاستە شەقام).

(٢١٠) ئایا ئەوانەی کە ڕێبازی ئیسلامیان ناوێت چاوەڕێی چی دەکەن؟ جگە لە هاتنی خوای گەورە بۆ لایان لە نێو سێبەری پەڵە هەوری سپی لەگەڵ فریشتەکاندا، ئەوکاتە هەموو شتێک کۆتایی پێ هێنرا (دەرگای تەوبە داخراو کۆتایی بە دنیا هات)، ئەوسا هەموو کارو فرمانێک هەر بۆ لای خوای پەروەردگار دەگەڕێتەوە.

سَلْ بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ كَمْ ءَاتَيْنَٰهُم مِّنْ ءَايَةٍۭ بَيِّنَةٍۗ وَمَن يُبَدِّلْ نِعْمَةَ ٱللَّهِ مِنۢ بَعْدِ مَا جَآءَتْهُ فَإِنَّ ٱللَّهَ شَدِيدُ ٱلْعِقَابِ ﴿٢١١﴾ زُيِّنَ لِلَّذِينَ كَفَرُوا۟ ٱلْحَيَوٰةُ ٱلدُّنْيَا وَيَسْخَرُونَ مِنَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ۘ وَٱلَّذِينَ ٱتَّقَوْا۟ فَوْقَهُمْ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِۗ وَٱللَّهُ يَرْزُقُ مَن يَشَآءُ بِغَيْرِ حِسَابٍ ﴿٢١٢﴾ كَانَ ٱلنَّاسُ أُمَّةً وَٰحِدَةً فَبَعَثَ ٱللَّهُ ٱلنَّبِيِّـۧنَ مُبَشِّرِينَ وَمُنذِرِينَ وَأَنزَلَ مَعَهُمُ ٱلْكِتَٰبَ بِٱلْحَقِّ لِيَحْكُمَ بَيْنَ ٱلنَّاسِ فِيمَا ٱخْتَلَفُوا۟ فِيهِۚ وَمَا ٱخْتَلَفَ فِيهِ إِلَّا ٱلَّذِينَ أُوتُوهُ مِنۢ بَعْدِ مَا جَآءَتْهُمُ ٱلْبَيِّنَٰتُ بَغْيًۢا بَيْنَهُمْۖ فَهَدَى ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لِمَا ٱخْتَلَفُوا۟ فِيهِ مِنَ ٱلْحَقِّ بِإِذْنِهِۦۗ وَٱللَّهُ يَهْدِى مَن يَشَآءُ إِلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ ﴿٢١٣﴾ أَمْ حَسِبْتُمْ أَن تَدْخُلُوا۟ ٱلْجَنَّةَ وَلَمَّا يَأْتِكُم مَّثَلُ ٱلَّذِينَ خَلَوْا۟ مِن قَبْلِكُمۖ مَّسَّتْهُمُ ٱلْبَأْسَآءُ وَٱلضَّرَّآءُ وَزُلْزِلُوا۟ حَتَّىٰ يَقُولَ ٱلرَّسُولُ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ مَعَهُۥ مَتَىٰ نَصْرُ ٱللَّهِۗ أَلَآ إِنَّ نَصْرَ ٱللَّهِ قَرِيبٌ ﴿٢١٤﴾ يَسْـَٔلُونَكَ مَاذَا يُنفِقُونَۖ قُلْ مَآ أَنفَقْتُم مِّنْ خَيْرٍ فَلِلْوَٰلِدَيْنِ وَٱلْأَقْرَبِينَ وَٱلْيَتَٰمَىٰ وَٱلْمَسَٰكِينِ وَٱبْنِ ٱلسَّبِيلِۗ وَمَا تَفْعَلُوا۟ مِنْ خَيْرٍ فَإِنَّ ٱللَّهَ بِهِۦ عَلِيمٌ ﴿٢١٥﴾

(٢١١) (ئەی محمد ﷺ) لە نەوەی ئیسرائیل بپرسە: چەندە بەڵگەی روون و ئاشكرامان پێ بەخشیوون؟ جا ئەوەی نیعمەتی خوا بگۆڕێت، (لە یەكخواناسی لابدات) دوای ئەوەی بۆی هاتووە، ئەوە بەڕاستی خوا تۆڵەی زۆر سەخت و بە ئازارە (لەو جۆرە كەسانە).

(٢١٢) ژیانی دنیا رازێنراوەتەوە بۆ بێباوەڕان (بەلام لەباتی سوپاسگوزاری) گاڵتە دەكەن بە باوەڕداران (لەبەر هەژاری و نەداری و كەم دەسەلاتی)، بێگومان ئەوانەی كە خاوەنی تەقواو لە خوا ترسان بوون لە ڕۆژی قیامەتدا لە سەرویانەوەن (لە بەهەشتی بەرزو بەریندا، ئەوانیش لە ناخی دۆزەخدان) و خوا (لە دنیادا) رزق و رۆزی دەبەخشێت بە هەموو كەس بێ ئەوەی گوێ بداتە بیرو باوەڕیان.

(٢١٣) (لە سەرەتای پەیدابونی خەڵكیدا، پێش تۆفانەكەی نوح) خەڵكی، یەك ئوممەت بوون و خاوەنی تەنها بیروباوەڕی یەكتاناسین بون، (بەلام بەرەبەرە لایاندا) خوایش وێڵی نەكردن و پێغەمبەرانی رەوانەكرد، تا مژدەدەرو ترسێنەرین هاوڕێ لەگەڵ كتێبی ئاسمانیدا، بۆ روون كردنەوەی حەق و راستی، تا لەنێوان خەڵكیدا فەرمانڕەوایی و دادوەری ئەنجام بدات لەسەر ئەو شتانەی كە بۆتە كێشەیان و راو بۆچوونیان لەسەری جیاوازە، كەسیش جیاوازی وكێشەی لەسەر بەرپا نەكرد جگە لەوانەی كە ئەو كتێبانەیان پێ بەخشراوە (كە گاورو جوولەكەن) دوای ئەوەی بەڵگەو نیشانەی روون و ئاشكرایان بۆ هات(كە قورئانە، ئینجا كێشە و دووبەرەكیان تێدا دروست بوو)، ئەمەش بەهۆی حەسادەت و ستەم كردنیانەوە (بۆیە پەیڕەوی حەق و راستییان نەكرد)، ئەوسا خوا هیدایەت و رێنموویی ئیماندارانی كرد بۆ دۆزینەوەی حەق و پەیڕەوی كردنی لە نێوان ئەو مەسەلانەی كە ئەوان كێشەیان لەسەری هەبوو و خوا رێنموویی هەركەسێك دەكات كە بیەوێت و (شایستە بێت) بۆ رێگە و رێبازی راست و دروست.

(٢١٤) ئایا لاتان‌وایە هەروا بە ئاسانی دەچنە بەهەشتەوە (بێ تەنگانە و ناخۆشی)؟! مەگەر نموونەی ئیماندارانی پێشوتان بۆ باس نەكراوە، كە تووشی شەڕو ناخۆشی و تەنگانە و گرانی و نەداری بوون و تەكانیان خواردوە و زۆریان بۆ هاتووە بەرادەیەك، هەتا پێغەمبەرەكەیان و ئەوانەی باوەڕیان هێناوە لەگەڵیدا، دەیانوت: كەی پەروەردگار سەركەوتن دەبەخشێت؟! ئیتر كەی خوا یارمەتی دەنێرێت؟! ئاگاداربن و دڵنیابن بەڕاستی یارمەتی خوایی زۆر نزیكە.

(٢١٥) لە تۆ دەپرسن (ئەی پێغەمبەر ﷺ) كەچی ببەخشن و بەكێی ببەخشن؟ پێیان بڵێ: هەر خێرێك دەكەن سەرەتا دایك و باوكتان فەرامۆش مەكەن، هەروەها خزمان و هەتیوان و هەژاران و رێبوارانی نەداریش، هەر خێرو چاكەیەكیش ئەنجام دەدەن، دڵنیابن كە خوا زانا و ئاگادارە لێی.

كُتِبَ عَلَيْكُمُ الْقِتَالُ وَهُوَ كُرْهٌ لَّكُمْ وَعَسَىٰ أَن تَكْرَهُوا شَيْئًا وَهُوَ خَيْرٌ لَّكُمْ وَعَسَىٰ أَن تُحِبُّوا شَيْئًا وَهُوَ شَرٌّ لَّكُمْ وَاللَّهُ يَعْلَمُ وَأَنتُمْ لَا تَعْلَمُونَ ﴿٢١٦﴾ يَسْأَلُونَكَ عَنِ الشَّهْرِ الْحَرَامِ قِتَالٍ فِيهِ قُلْ قِتَالٌ فِيهِ كَبِيرٌ وَصَدٌّ عَن سَبِيلِ اللَّهِ وَكُفْرٌ بِهِ وَالْمَسْجِدِ الْحَرَامِ وَإِخْرَاجُ أَهْلِهِ مِنْهُ أَكْبَرُ عِندَ اللَّهِ وَالْفِتْنَةُ أَكْبَرُ مِنَ الْقَتْلِ وَلَا يَزَالُونَ يُقَاتِلُونَكُمْ حَتَّىٰ يَرُدُّوكُمْ عَن دِينِكُمْ إِنِ اسْتَطَاعُوا وَمَن يَرْتَدِدْ مِنكُمْ عَن دِينِهِ فَيَمُتْ وَهُوَ كَافِرٌ فَأُولَٰئِكَ حَبِطَتْ أَعْمَالُهُمْ فِي الدُّنْيَا وَالْآخِرَةِ وَأُولَٰئِكَ أَصْحَابُ النَّارِ هُمْ فِيهَا خَالِدُونَ ﴿٢١٧﴾ إِنَّ الَّذِينَ آمَنُوا وَالَّذِينَ هَاجَرُوا وَجَاهَدُوا فِي سَبِيلِ اللَّهِ أُولَٰئِكَ يَرْجُونَ رَحْمَتَ اللَّهِ وَاللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿٢١٨﴾ يَسْأَلُونَكَ عَنِ الْخَمْرِ وَالْمَيْسِرِ قُلْ فِيهِمَا إِثْمٌ كَبِيرٌ وَمَنَافِعُ لِلنَّاسِ وَإِثْمُهُمَا أَكْبَرُ مِن نَّفْعِهِمَا وَيَسْأَلُونَكَ مَاذَا يُنفِقُونَ قُلِ الْعَفْوَ كَذَٰلِكَ يُبَيِّنُ اللَّهُ لَكُمُ الْآيَاتِ لَعَلَّكُمْ تَتَفَكَّرُونَ ﴿٢١٩﴾



(٢١٦) جەنگ لەسەرتان بڕیار دراوە کەشتێکی گرانە لاتان (ئیماندار بەجەستە لای گرانە بەڵام ڕۆحی پێی ئاسوودەیە بۆ بەرگری لە ئیسلام و لابردنی کۆسپەکان) بەڵام لەوانەیە شتێکتان لا ناخۆش بێت کەچی خێر لەوەدا بێت، هەروەها لەوانەیە شتێکتان پێ خۆش بێت کەچی شەڕ لەوەدا بێت، بێگومان هەر خواخۆی دەزانێت (خێر لەچیدایە)، ئێوە نایزانن.

(جەنگ لە ئیسلامدا بۆ بەرهەڵستی کردنی دوژمنانی داگیرکەرو دوژمنانی دینە و بۆ لابردنی ئەو کۆسپانەیە کە نایەڵن خەڵک ئازادانە بژین و ئازادانە ئەو ڕێبازە هەڵبژێرن کە خۆیان قەناعەتیان پێیەتی، هەرگیز بۆ ئەوە نیە کە بە زۆر خەڵک موسوڵمان ببێت و مێژووی ئیسلام شایەتی حاڵەو ئەگەر کارێکی وا رووی دابێت ئەوە ئاینی ئیسلام لێی بەرییە).

(٢١٧) پرسیارت لێدەکەن دەربارەی جەنگ لە مانگی حەرامدا (کە بریتین لە ـ ذوالعقدة ـ ذوالحجة ـ محرم ـ رجب)، بڵێ: جەنگ لەو جۆرە مانگانەدا کارەسات و هەڵەیەکی گەورەیە، بەرهەڵستی ڕێبازی خواو بێباوەڕی پێی، جەنگ لە مزگەوتی حەرامدا و دەربەدەر کردنی خەڵکەکەی زۆر گەورەترە لای خوا (لە کوشتنی کەسێک یان چەند کەسێک لە مانگی حەرامدا) هەروەها ئازاردانی ئیماندار تا هاوەڵگەر بێت و پاشگەز بێتەوە تاوانێکە لە کوشتن گەورەترە، (بێگومان بێ باوەڕان) بەردەوام دژتان دەجەنگن هەتا واتان لێبکەن لە دین و ئاینتان پاشگەز ببنەوە، ئەگەر بۆیان بکرێت، جا هەر کەس لە ئێوە پاشگەز بێتەوە لە ئاینەکەی و بە کافریش بمرێت، ئا ئەو جۆرە کەسانە کارەکانیان پووچەڵ دەبێت لە دنیاو قیامەتدا و ئەوانە جێنشینی ناو ئاگری دۆزەخن و ژیانی هەمیشەیی تیایدا دەبەنە سەر.

(٢١٨) بەڕاستی ئەوانەی کە باوەڕیان هێناوەو ئەوانەی کۆچ و جیهادو تێکۆشانیان کردووە لە پێناو ڕێبازی خوادا، ئا ئەوانە بەهیوا و بەتەمای ڕەحمەت و میهرەبانی خوای پەروەردگارن، بەراستی خوایش زۆر لێخۆشبوو و دلۆڤانە.

(٢١٩) پرسیارت لێدەکەن دەربارەی عەرەق و قومار، پێیان بڵێ: لەو دووانەدا تاوان و گوناهێکی گەورە هەیە، هەر چەندە چەند سوودێکیشیان تێدایە بۆ خەڵکانێک، بێگومان گوناهەکەیان گەورەترە لە کەڵک و سوودیان، پرسیارت لێدەکەن کە چی ببەخشن؟ پێیان بڵێ: هەرچیتان لێ زیادە دەتوانن بیبەخشن، ئا بەو شێوەیە خوای گەورە ئەم بەڵگەو فەرمانانەتان بۆ روون و ئاشکرا دەکات بۆ ئەوەی بیر بکەنەوەو (واز لەو شتانە بهێنن کە زیانیان زۆرترە لە سوودیان، وەچی بۆ هەردوو جیهانتان چاکە ئەوە بکەن)...

فِي ٱلدُّنْيَا وَٱلْـَٔاخِرَةِ ۗ وَيَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلْيَتَـٰمَىٰ ۖ قُلْ إِصْلَاحٌ لَّهُمْ خَيْرٌ ۖ وَإِن تُخَالِطُوهُمْ فَإِخْوَٰنُكُمْ ۚ وَٱللَّهُ يَعْلَمُ ٱلْمُفْسِدَ مِنَ ٱلْمُصْلِحِ ۚ وَلَوْ شَآءَ ٱللَّهُ لَأَعْنَتَكُمْ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَزِيزٌ حَكِيمٌ ﴿٢٢٠﴾ وَلَا تَنكِحُوا۟ ٱلْمُشْرِكَـٰتِ حَتَّىٰ يُؤْمِنَّ ۚ وَلَأَمَةٌ مُّؤْمِنَةٌ خَيْرٌ مِّن مُّشْرِكَةٍ وَلَوْ أَعْجَبَتْكُمْ ۗ وَلَا تُنكِحُوا۟ ٱلْمُشْرِكِينَ حَتَّىٰ يُؤْمِنُوا۟ ۚ وَلَعَبْدٌ مُّؤْمِنٌ خَيْرٌ مِّن مُّشْرِكٍ وَلَوْ أَعْجَبَكُمْ ۗ أُو۟لَـٰٓئِكَ يَدْعُونَ إِلَى ٱلنَّارِ ۖ وَٱللَّهُ يَدْعُوٓا۟ إِلَى ٱلْجَنَّةِ وَٱلْمَغْفِرَةِ بِإِذْنِهِۦ ۖ وَيُبَيِّنُ ءَايَـٰتِهِۦ لِلنَّاسِ لَعَلَّهُمْ يَتَذَكَّرُونَ ﴿٢٢١﴾ وَيَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلْمَحِيضِ ۖ قُلْ هُوَ أَذًى فَٱعْتَزِلُوا۟ ٱلنِّسَآءَ فِى ٱلْمَحِيضِ ۖ وَلَا تَقْرَبُوهُنَّ حَتَّىٰ يَطْهُرْنَ ۖ فَإِذَا تَطَهَّرْنَ فَأْتُوهُنَّ مِنْ حَيْثُ أَمَرَكُمُ ٱللَّهُ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلتَّوَّٰبِينَ وَيُحِبُّ ٱلْمُتَطَهِّرِينَ ﴿٢٢٢﴾ نِسَآؤُكُمْ حَرْثٌ لَّكُمْ فَأْتُوا۟ حَرْثَكُمْ أَنَّىٰ شِئْتُمْ ۖ وَقَدِّمُوا۟ لِأَنفُسِكُمْ ۚ وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَٱعْلَمُوٓا۟ أَنَّكُم مُّلَـٰقُوهُ ۗ وَبَشِّرِ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴿٢٢٣﴾ وَلَا تَجْعَلُوا۟ ٱللَّهَ عُرْضَةً لِّأَيْمَـٰنِكُمْ أَن تَبَرُّوا۟ وَتَتَّقُوا۟ وَتُصْلِحُوا۟ بَيْنَ ٱلنَّاسِ ۗ وَٱللَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ ﴿٢٢٤﴾

(٢٢٠) (ئەوەی بەرژەوەندی ئێوەی تێدایە) لە دنیاو قیامەتدا (خوا ڕوونی کردۆتەوە)، هەروەها پرسیارت لێدەکەن دەربارەی هەتیوان (کە چۆن بن بۆیان) پێیان بڵێ: چاکسازی و پەروەردەکردنیان لە هەمووشت چاکترو پەسەندترە، خۆ ئەگەر تێکەڵاویان بکەن و بیانهێننە ماڵتان ئەوانە براتانن (دەبێت بەچاکی چاودێری خۆیان و ماڵیان بکەن) خوایش کەسانی خراپساز(ئەوانەی تۆوی خراپە دەچێنن) و چاکسازتان دەزانێ و جیای دەکاتەوە، ئەگەر خوا بیویستایە باری گران دەکردن و مەرجی سەختی دادەنا (دەربارەی چاودێری هەتیوان)، چونکە بەڕاستی خوا باڵادەست و داناو کاربەجێیە.

(٢٢١) ئافرەتانی موشریک و خوانەناس مارە مەکەن هەتا ئیمان و باوەڕ دەهێنن، بێگومان کەنیزەکێکی ئیماندار چاکترە لە ئافرەتێکی موشریک و خوانەناس، هەرچەندە (جوانییەکەی، یان سامانەکەی، یان پلەو پایەکەی) سەرسامی کردبن و ژن مارە مەبڕن لە پیاوانی موشریک و خوانەناس هەتا ئیمان و باوەڕ دەهێنن و بەڕاستی بەندەیەکی ئیماندار چاکترە لە موشریک و خوانەناسێک، هەرچەندە سەرسامی کردبن (قەدو قیافەو پلەوپایەو سامانەکەی)، ئائەو خوانەناسانە بانگەوازی مەردوم دەکەن بەرەو دۆزەخ، خوایش بانگهێشتی مەردومان دەکات بەرەو بەهەشت و لێخۆشبوون بە فەرمان و ئیزنی خۆی (کە گوێڕایەڵی ڕێبازەکەیەتی) و خوا ئایەتەکانی (قورئانەکەی) بەڕوونی دەخاتە بەرچاو بۆ خەڵکی، بۆ ئەوەی یاداوەری وەربگرن و تێبگەن.

(٢٢٢) (ئەی پێغەمبەرﷺ) پرسیارت لێدەکەن دەربارەی (عادەتی مانگانەی ئافرەت) پێیان بڵێ: ئەوە ئازارو زەرەرە، کەوابوو خۆتان بە دوور بگرن لە هاوسەرەکانتان کە لەو حاڵەتەدا بن و نزیکیان مەکەون تا پاک دەبنەوە، جاکاتێک پاک و خاوێن بوونەوەو خۆیان شت بچنە لایان، بەو شێوەیەی کە خوا فەرمانی داوە، بەڕاستی خوا تەوبەکاران و پاکانی خۆشدەوێت (ئەوانەی ڕواڵەت و ناوەڕۆکیان پاکە).

(٢٢٣) ژنانی هاوسەرتان کێڵگەن بۆتان و شوێنی چاندنی وەچەن، جا بە هەر شێوەیەک دەتانەوێت تۆو بوەشێننە ناو کێڵگەکەتانەوە (بە هیوای بەرهەم) و بۆ خۆتان دەست پێشکەری بکەن (سەرەتا هاوسەری خواناس و چاک هەڵبژێرن، لەوەودواش دوعاو نزاو خواپەرستی بەردەوام فەرامۆش مەکەن)و لە خوا بترسن و خۆتان لە خراپە بپارێزن و چاک بزانن و دڵنیابن کە بە دیداری خوا شاد دەبن و ئەم مژدەیەش بدە بە ئیمانداران.

(٢٢٤) نەکەن سوێند خواردن بەخوا بکەنە کۆسپ لەبەرامبەر چاکەکاری و ئاینداری و ڕێکخستنی خەڵکیدا (واتە کەفارەتی سوێندەکانتان بدەن و لە چاکەو چاکەکاری درێغی مەکەن) چونکە خوا زۆر بیسەرو زانایە.

لَّا يُؤَاخِذُكُمُ ٱللَّهُ بِٱللَّغۡوِ فِيٓ أَيۡمَٰنِكُمۡ وَلَٰكِن يُؤَاخِذُكُم بِمَا كَسَبَتۡ قُلُوبُكُمۡۗ وَٱللَّهُ غَفُورٌ حَلِيمٞ ﴿٢٢٥﴾ لِّلَّذِينَ يُؤۡلُونَ مِن نِّسَآئِهِمۡ تَرَبُّصُ أَرۡبَعَةِ أَشۡهُرٖۖ فَإِن فَآءُو فَإِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٞ رَّحِيمٞ ﴿٢٢٦﴾ وَإِنۡ عَزَمُواْ ٱلطَّلَٰقَ فَإِنَّ ٱللَّهَ سَمِيعٌ عَلِيمٞ ﴿٢٢٧﴾ وَٱلۡمُطَلَّقَٰتُ يَتَرَبَّصۡنَ بِأَنفُسِهِنَّ ثَلَٰثَةَ قُرُوٓءٖۚ وَلَا يَحِلُّ لَهُنَّ أَن يَكۡتُمۡنَ مَا خَلَقَ ٱللَّهُ فِيٓ أَرۡحَامِهِنَّ إِن كُنَّ يُؤۡمِنَّ بِٱللَّهِ وَٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِۚ وَبُعُولَتُهُنَّ أَحَقُّ بِرَدِّهِنَّ فِي ذَٰلِكَ إِنۡ أَرَادُوٓاْ إِصۡلَٰحٗاۚ وَلَهُنَّ مِثۡلُ ٱلَّذِي عَلَيۡهِنَّ بِٱلۡمَعۡرُوفِۚ وَلِلرِّجَالِ عَلَيۡهِنَّ دَرَجَةٞۗ وَٱللَّهُ عَزِيزٌ حَكِيمٌ ﴿٢٢٨﴾ ٱلطَّلَٰقُ مَرَّتَانِۖ فَإِمۡسَاكُۢ بِمَعۡرُوفٍ أَوۡ تَسۡرِيحُۢ بِإِحۡسَٰنٖۗ وَلَا يَحِلُّ لَكُمۡ أَن تَأۡخُذُواْ مِمَّآ ءَاتَيۡتُمُوهُنَّ شَيۡـًٔا إِلَّآ أَن يَخَافَآ أَلَّا يُقِيمَا حُدُودَ ٱللَّهِۖ فَإِنۡ خِفۡتُمۡ أَلَّا يُقِيمَا حُدُودَ ٱللَّهِ فَلَا جُنَاحَ عَلَيۡهِمَا فِيمَا ٱفۡتَدَتۡ بِهِۦۗ تِلۡكَ حُدُودُ ٱللَّهِ فَلَا تَعۡتَدُوهَاۚ وَمَن يَتَعَدَّ حُدُودَ ٱللَّهِ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلظَّٰلِمُونَ ﴿٢٢٩﴾ فَإِن طَلَّقَهَا فَلَا تَحِلُّ لَهُۥ مِنۢ بَعۡدُ حَتَّىٰ تَنكِحَ زَوۡجًا غَيۡرَهُۥۗ فَإِن طَلَّقَهَا فَلَا جُنَاحَ عَلَيۡهِمَآ أَن يَتَرَاجَعَآ إِن ظَنَّآ أَن يُقِيمَا حُدُودَ ٱللَّهِۗ وَتِلۡكَ حُدُودُ ٱللَّهِ يُبَيِّنُهَا لِقَوۡمٖ يَعۡلَمُونَ ﴿٢٣٠﴾

(٢٢٥) خوای گەورە ئەو سوێندانەتان لێناگرێت کە لە دەمتان دەردەچێت و لەسەری ڕاهاتوون، بەڵکو لەسەرئەوە لێتان دەگرێت و موحاسەبەتان دەکات کە نیەتی دڵتانی لەسەرە و خوا لێخۆشبووە (لە گوناهەکەتان) و ئارامگرو خۆڕاگرە (زوو تۆڵە لە یاخی و سوێند خۆران ناسێنێت).

(٢٢٦) بۆ ئەوانەی کە سوێند دەخۆن نزیکی هاوسەریان نەکەون، بۆیان هەیە تا چوار مانگ چاوەڕوانی بکەن (دەبێت لەو ماوەیەدا بڕیاری یەکجاری بدەن)، خۆ ئەگەر ئاشت بوونەوە و ڕێککەوتن، ئەوە خوا لێخۆشبوو و میهرەبانە.

(٢٢٧) خۆ ئەگەر سوور بوون لەسەر تەڵاق دانیان، ئەوە بەڕاستی خوا بیسەری(بڕیاریانە)و زانایە (بە نیەتیان).

(٢٢٨) ژنانی تەڵاقدراو، دەبێت تا سێ جار عادەتی مانگانە چاوەڕێ بکەن و(شوونەکەنەوە) و حەڵاڵ نیە بۆیان ئەوەی خوا لە منداڵدانیاندا دروستی کردووە (منداڵ یان حەیز) بیشارنەوە، ئەگەر باوەڕیان بە خواو بەڕۆژی دوایی دامەزراوە، (لەو ماوەیەدا) هاوسەرەکانیان شایستەن بەگێڕانەوەیان لە ماوەی چاوەڕوانی و عیدەدا، ئەگەر ویستیان چاکسازی لە ژیانی خۆیاندا بکەن (ئەمەش بۆ تەڵاقی ڕەجعیە)، ژنان مافیان هەیە بەسەر پیاوانەوە بەوێنەی ئەو مافانەی کە بۆ پیاوانە لەسەر ژنان بەگوێرەی باو و نەریتێک کە پەسەندە لە ئیسلامدا و پیاوان بەسەر ئافرەتانەوە یەک پلەیان هەیە (ئەویش دەسەڵاتی گێڕانەوەی ژنەکانیانە لەکاتی تەڵاقی ڕەجعیدا)و خوا باڵادەست و دانایە (باڵادەستە بەسەر هەمووانداو دانایە لە دابەشکردنی ماف و ئەرکەکاندا).

(٢٢٩) تەڵاقێک (کە پیاو بتوانێت هاوسەرەکەی تێدا بگێڕێتەوە) دووجارە، دووکەرەتە (پیاو بۆی هەیە تەڵاقی هاوسەرەکەی بدات و چاکترین شێوازی ئەوەیە کە لە سوننەتی پێغەمبەردا ﷺ ڕوون کراوەتەوە)، لەوەودوا واتە بۆ سێهەم جار ئیتر ئەگەر دەیەوێت ژیانی هاوسەریی بباتە سەر (نابێت تەڵاق بێت بەدەمیداو ئەگەر هات) دەبێت بەچاکی و بەڕێک و پێکی دەست بەرداری ببێت و بۆتان حەڵاڵ نیە هیچ شتێکیان لێ بسێننەوە لە مارەیی و ئەو شتانەی پێتان بەخشیوون، مەگەر بترسن لەوەی کە نەتوانن سنوورەکانی خوا چاودێری بکەن و (ستەم لە یەک بکەن)، خۆ ئەگەر (ئەی قازییەکان، ئەی خێرخوازان) ترسان لەوەی کە ژن ومێردەکە سنووری خوا ڕاناگرن و (خۆیان گوناهبار دەکەن) ئەوە ئێوە هیچ گوناهبار نابن کاتێک کە دڵنیان ئافرەتەکە دەیەوێت (بە هەندێک سامان، یان دەست هەڵگرتن لە هەندێک مارەیی) خۆی ڕزگار بکات، دڵنیابن ئەو شتانەی کە باسکران سنوورەکانی خوای پەروەردگارن، لێی مەترازێن و سنوورشکێنی مەکەن، ئەوەی دەستدرێژی بکاتە سەر سنوورەکانی خوا، ئا ئەو جۆرە کەسانە ستەمکارن.

(٢٣٠) خۆ ئەگەر (بۆ جاری سێهەم، پیاو ژنەکەی خۆی) تەڵاقدا، ئەوە ئیتر جارێکی تر بۆی حەڵاڵ نابێت مەگەر دوای ئەوەی شوویەکی تر بکات و (هاوسەری دووهەمی بەشێوەیەکی ئاسایی تەڵاقی بدات، یان بمرێت)، ئەوە بۆیان هەیە بگەڕێنەوە بۆ لای یەکترو(ژیانی ژن و مێردایەتی دەست پێبکەنەوە)، ئەگەر گومان و ڕایان وابوو دەتوانن سنوورەکانی خوا ڕاگرن و(ژیانێکی ئاسودەیی ببەنە سەر)، جا ئەوەی کە باسکرا سنوورەکانی خوای گەورەن، ڕوونیان دەکاتەوە بۆ گەلێک کە بزانن و تێبگەن.

وَإِذَا طَلَّقْتُمُ ٱلنِّسَآءَ فَبَلَغْنَ أَجَلَهُنَّ فَأَمْسِكُوهُنَّ بِمَعْرُوفٍ أَوْ سَرِّحُوهُنَّ بِمَعْرُوفٍۚ وَلَا تُمْسِكُوهُنَّ ضِرَارًا لِّتَعْتَدُوا۟ۚ وَمَن يَفْعَلْ ذَٰلِكَ فَقَدْ ظَلَمَ نَفْسَهُۥۚ وَلَا تَتَّخِذُوٓا۟ ءَايَٰتِ ٱللَّهِ هُزُوًاۚ وَٱذْكُرُوا۟ نِعْمَتَ ٱللَّهِ عَلَيْكُمْ وَمَآ أَنزَلَ عَلَيْكُم مِّنَ ٱلْكِتَٰبِ وَٱلْحِكْمَةِ يَعِظُكُم بِهِۦۚ وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَٱعْلَمُوٓا۟ أَنَّ ٱللَّهَ بِكُلِّ شَىْءٍ عَلِيمٌ ﴿٢٣١﴾ وَإِذَا طَلَّقْتُمُ ٱلنِّسَآءَ فَبَلَغْنَ أَجَلَهُنَّ فَلَا تَعْضُلُوهُنَّ أَن يَنكِحْنَ أَزْوَٰجَهُنَّ إِذَا تَرَٰضَوْا۟ بَيْنَهُم بِٱلْمَعْرُوفِۗ ذَٰلِكَ يُوعَظُ بِهِۦ مَن كَانَ مِنكُمْ يُؤْمِنُ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْءَاخِرِۗ ذَٰلِكُمْ أَزْكَىٰ لَكُمْ وَأَطْهَرُۗ وَٱللَّهُ يَعْلَمُ وَأَنتُمْ لَا تَعْلَمُونَ ﴿٢٣٢﴾ ۞ وَٱلْوَٰلِدَٰتُ يُرْضِعْنَ أَوْلَٰدَهُنَّ حَوْلَيْنِ كَامِلَيْنِۖ لِمَنْ أَرَادَ أَن يُتِمَّ ٱلرَّضَاعَةَۚ وَعَلَى ٱلْمَوْلُودِ لَهُۥ رِزْقُهُنَّ وَكِسْوَتُهُنَّ بِٱلْمَعْرُوفِۚ لَا تُكَلَّفُ نَفْسٌ إِلَّا وُسْعَهَاۚ لَا تُضَآرَّ وَٰلِدَةٌۢ بِوَلَدِهَا وَلَا مَوْلُودٌ لَّهُۥ بِوَلَدِهِۦۚ وَعَلَى ٱلْوَارِثِ مِثْلُ ذَٰلِكَۗ فَإِنْ أَرَادَا فِصَالًا عَن تَرَاضٍ مِّنْهُمَا وَتَشَاوُرٍ فَلَا جُنَاحَ عَلَيْهِمَاۗ وَإِنْ أَرَدتُّمْ أَن تَسْتَرْضِعُوٓا۟ أَوْلَٰدَكُمْ فَلَا جُنَاحَ عَلَيْكُمْ إِذَا سَلَّمْتُم مَّآ ءَاتَيْتُم بِٱلْمَعْرُوفِۗ وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَٱعْلَمُوٓا۟ أَنَّ ٱللَّهَ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ ﴿٢٣٣﴾



(٢٣١) کاتێک ژنانی هاوسەرتان تەڵاقداو ئەوانیش گەیشتنە کۆتایی (عیددەیان) ئەوسا یان بیانهێڵنەوە لای خۆتان بەچاکە و ڕێزەوە، یان دەست بەرداریان ببن بە چاکە و ڕێزەوە، مەیان هێڵنەوە بە ئێش و ئازارەوە بۆ ئەوەی دەست درێژی و ستەمیان لێبکەن، هەرکەس ئەوە بکات ئەوە ستەمی لە خۆی کردووە، نەکەن ئایەت و ڕێنموویەکانی خوا بەگاڵتە بگرن، یادی نازو نیعمەتی خوا بکەنەوە لەسەرتان، هەروەها یادی ئەو شتانە بکەنەوە کە لە قورئاندا بۆتان ڕەوانە کراوە کە پڕە لە دانایی، لەکاتێکدا ئامۆژگاریتان دەکات بەوانە و هەوڵ بدەن خواناس و ئاین پەروەر بن و چاک بزانن کە: بەڕاستی، خوا بە هەموو شتێک زانایە.

(٢٣٢) هەروەها ئەگەر ژنانتان تەڵاقداو گەیشتنە کۆتایی عادەی مانگانەیان، ئێوە (ئەی کەسوکاری ژن) مەبنە کۆسپ لە ڕێگەیاندا ئەگەر ویستیان شوو بکەنەوە بە هاوسەرەکانیان، (یاخود ویستیان شوویەکی‌تر بکەن)، کاتێک ئەوان لە نێوان خۆیاندا ڕەزامەندییان نواند بە شێوەیەکی جوان، ئەم (فەرمان و ڕێنموویانە) ئامۆژگاری ئەو کەسانەی پێ دەکرێت لە ئێوە کە باوەڕی بە خواو ڕۆژی قیامەت هەبێت، ئەو جۆرە ڕەفتار و کردەوانەتان جوانترو پەسەندترو خاوێنترە، خوای پەروەردگاریش چاک دەزانێت (چی خێرە بۆتان) و ئێوە نایزانن و دەرکی ناکەن.

(٢٣٣) دایکان (تەڵاقدراو بن یان نەء) دوو ساڵی تەواو با شیر بە منداڵەکانیان بدەن بۆ هەر کەس کە دەیەوێت شیری تەواو بدات و پێویستە لەسەر ئەو کەسەی خاوەنی منداڵەکەیە (واتە باوکی یان بەخێوکەری) رزق و ڕۆزی و پۆشاک بەشێوەیەکی جوان و پەسەندی ئامادە بکات، ئەرک لەسەر هیچ کەس دانانرێت جگە لە توانای خۆی، نابێت هیچ دایکێک زیانی پێ بگەیەنرێت بەهۆی منداڵەکەیەوە، هەروەها باوکیشی نابێت زیانی پێ بگەیەنرێت بەهۆی منداڵەکەیەوە و لەسەر میراتگری منداڵەکەشە وێنەی ئەو مافانەی کە باسکران، خۆ ئەگەر دایک و باوک هەر کاتێک بە ڕەزامەندی و پرس و ڕای هەردوولایان ویستیان منداڵەکەیان لە شیر ببڕنەوە، ئەوە قەیناکات و هیچ گوناهیان لەسەر نییە لەو بارەیەوە، خۆ ئەگەر ویستتان دایەن بۆ شیر پێدانی منداڵەکانتان بگرن، ئەوەش قەیناکات و هیچ گوناهتان لەسەرنییە، بەمەرجێک ماف وکرێیان بەجوانی و شایستە پێ بدەن، لە خوا بترسن و پارێزکاربن و چاک بزانن بەڕاستی خوا زۆر بینایە بەو کارو کردەوانەی کە ئەنجامی دەدەن.

وَالَّذِينَ يُتَوَفَّوْنَ مِنكُمْ وَيَذَرُونَ أَزْوَاجًا يَتَرَبَّصْنَ بِأَنفُسِهِنَّ أَرْبَعَةَ أَشْهُرٍ وَعَشْرًا ۖ فَإِذَا بَلَغْنَ أَجَلَهُنَّ فَلَا جُنَاحَ عَلَيْكُمْ فِيمَا فَعَلْنَ فِي أَنفُسِهِنَّ بِالْمَعْرُوفِ ۗ وَاللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرٌ ﴿٢٣٤﴾ وَلَا جُنَاحَ عَلَيْكُمْ فِيمَا عَرَّضْتُم بِهِ مِنْ خِطْبَةِ النِّسَاءِ أَوْ أَكْنَنتُمْ فِي أَنفُسِكُمْ ۚ عَلِمَ اللَّهُ أَنَّكُمْ سَتَذْكُرُونَهُنَّ وَلَٰكِن لَّا تُوَاعِدُوهُنَّ سِرًّا إِلَّا أَن تَقُولُوا قَوْلًا مَّعْرُوفًا ۚ وَلَا تَعْزِمُوا عُقْدَةَ النِّكَاحِ حَتَّىٰ يَبْلُغَ الْكِتَابُ أَجَلَهُ ۚ وَاعْلَمُوا أَنَّ اللَّهَ يَعْلَمُ مَا فِي أَنفُسِكُمْ فَاحْذَرُوهُ ۚ وَاعْلَمُوا أَنَّ اللَّهَ غَفُورٌ حَلِيمٌ ﴿٢٣٥﴾ لَّا جُنَاحَ عَلَيْكُمْ إِن طَلَّقْتُمُ النِّسَاءَ مَا لَمْ تَمَسُّوهُنَّ أَوْ تَفْرِضُوا لَهُنَّ فَرِيضَةً ۚ وَمَتِّعُوهُنَّ عَلَى الْمُوسِعِ قَدَرُهُ وَعَلَى الْمُقْتِرِ قَدَرُهُ مَتَاعًا بِالْمَعْرُوفِ ۖ حَقًّا عَلَى الْمُحْسِنِينَ ﴿٢٣٦﴾ وَإِن طَلَّقْتُمُوهُنَّ مِن قَبْلِ أَن تَمَسُّوهُنَّ وَقَدْ فَرَضْتُمْ لَهُنَّ فَرِيضَةً فَنِصْفُ مَا فَرَضْتُمْ إِلَّا أَن يَعْفُونَ أَوْ يَعْفُوَ الَّذِي بِيَدِهِ عُقْدَةُ النِّكَاحِ ۚ وَأَن تَعْفُوا أَقْرَبُ لِلتَّقْوَىٰ ۚ وَلَا تَنسَوُا الْفَضْلَ بَيْنَكُمْ ۚ إِنَّ اللَّهَ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ ﴿٢٣٧﴾

(٢٣٤) ئەو پیاوانەتان کە دەمرن و هاوسەران بەجێ دەهێڵن، پێویستە ئەو هاوسەرانە چوارمانگو دە شەو خۆیان بگرن و چاوەڕێ بکەن (شوو نەکەنەوە)، جا کە گەیشتنە کۆتایی ماوەی عیدەکەیان، ئەوە ئیتر هیچ گوناهتان لەسەرنی‌یە ئەی کەس و کاری ژن کە ڕێ بدەن ئەو ئافرەتانە بچنەوە دۆخی جارانیان لەوەی کە شەرع حەڵاڵی کردووە بۆیان پێش عیدە، خوای پەروەردگاریش زۆر ئاگادارە بەو کارو کردەوانەی ئەنجامی دەدەن.

(٢٣٥) هیچ گوناهێکیشتان لەسەرنی‌یە لەوەی بە ناڕاستەوخۆ خوازبێنی ژنانی مێرد مردوو بکەن (کە هێشتا ماوەی دیاریکراویان تەواو نەبووە و دروست نیە شوو بکەنەوە)، یاخود لە دڵی خۆتاندا بڕیاری خوازبێنیتان دابێت، خوای گەورە بەڕاستی زانیویەتی کە ئێوە لەمەودوا ناویان دەبەن و باسیان دەکەن، بەڵام نەکەن بە نهێنی بەڵێنیان لێ وەربگرن، مەگەر بەشێوازی گوفتارێکی چاک و دروست و باو نەبێت، نەکەن بڕیاری تەواوی مارەبڕینیان بدەن هەتا ماوەی دیاری کراو تەواو نەبێت و چاکیش بزانن بەڕاستی خوا دەزانێت بەوەی کە لە دڵ و دەروونتاندایە، کەواتە خۆتان بپارێزن (لە قەدەغە کراوەکانی خوا)، دڵنیابن و چاک بزانن کە خوا زۆر لێخۆشبوو و خۆڕاگرو لەسەرخۆیە.

(٢٣٦) هیچ گوناهتان لەسەرنی‌یە ئەگەر ژنانێک تەڵاق بدەن کە هێشتا نەچووبنە لایان، یاخود مارەییتان بۆ دیاری نەکرد بوون، پێویستە لەسەرتان هەندێک سامانیان بدەنێ، جا ئەوەی دەوڵەمەندەو زۆری هەیە و ئەوەی کە هەژارو کەم دەستە (هەرکەس) بەپێی توانای خۆی، ئەم دیاری و یارمەتییانە بەشێوەیەک بێت کە باوو پەسەندی شەرع بێت ، ئەمەش ئەرکێکی پێویستە لەسەر چاکەکاران.

(٢٣٧) خۆ ئەگەر ژنانتان تەڵاقدا پێش ئەوەی بچنە لایان، لە هەمان کاتیشدا مارەییتان بۆ دیاری کردبوون، ئەوە دەبێت نیوەی مارەییە دیاری کراوەکەیان بدەنێ، مەگەر خۆیان نەیانەوێت و چاوپۆشی لێبکەن، یان ئەو کەسە چاوپۆشی بکات کە مارە برینەکەی بەدەستە، چاوپۆشی و لێبووردنتان لە مافی خۆتان لە پارێزکاریەوە نزیکترەو چاکەو پیاوەتی نێوان یەکتر فەرامۆش مەکەن، بەڕاستی خوا بینایە بەو کاروکردەوانەی کە ئەنجامی دەدەن.

حَـٰفِظُواْ عَلَى ٱلصَّلَوَٰتِ وَٱلصَّلَوٰةِ ٱلْوُسْطَىٰ وَقُومُواْ لِلَّهِ
قَـٰنِتِينَ ﴿٢٣٨﴾ فَإِنْ خِفْتُمْ فَرِجَالًا أَوْ رُكْبَانًا فَإِذَآ أَمِنتُمْ
فَٱذْكُرُواْ ٱللَّهَ كَمَا عَلَّمَكُم مَّا لَمْ تَكُونُواْ تَعْلَمُونَ
﴿٢٣٩﴾ وَٱلَّذِينَ يُتَوَفَّوْنَ مِنكُمْ وَيَذَرُونَ أَزْوَٰجًا وَصِيَّةً
لِّأَزْوَٰجِهِم مَّتَـٰعًا إِلَى ٱلْحَوْلِ غَيْرَ إِخْرَاجٍ فَإِنْ خَرَجْنَ
فَلَا جُنَاحَ عَلَيْكُمْ فِى مَا فَعَلْنَ فِىٓ أَنفُسِهِنَّ مِن
مَّعْرُوفٍ وَٱللَّهُ عَزِيزٌ حَكِيمٌ ﴿٢٤٠﴾ وَلِلْمُطَلَّقَـٰتِ مَتَـٰعٌۢ
بِٱلْمَعْرُوفِ حَقًّا عَلَى ٱلْمُتَّقِينَ ﴿٢٤١﴾ كَذَٰلِكَ يُبَيِّنُ
ٱللَّهُ لَكُمْ ءَايَـٰتِهِۦ لَعَلَّكُمْ تَعْقِلُونَ ﴿٢٤٢﴾ ۞ أَلَمْ تَرَ
إِلَى ٱلَّذِينَ خَرَجُواْ مِن دِيَـٰرِهِمْ وَهُمْ أُلُوفٌ حَذَرَ ٱلْمَوْتِ
فَقَالَ لَهُمُ ٱللَّهُ مُوتُواْ ثُمَّ أَحْيَـٰهُمْ إِنَّ ٱللَّهَ لَذُو فَضْلٍ عَلَى
ٱلنَّاسِ وَلَـٰكِنَّ أَكْثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَشْكُرُونَ ﴿٢٤٣﴾
وَقَـٰتِلُواْ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ وَٱعْلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ سَمِيعٌ عَلِيمٌ ﴿٢٤٤﴾
مَّن ذَا ٱلَّذِى يُقْرِضُ ٱللَّهَ قَرْضًا حَسَنًا فَيُضَـٰعِفَهُۥ لَهُۥٓ أَضْعَافًا
كَثِيرَةً وَٱللَّهُ يَقْبِضُ وَيَبْصُۜطُ وَإِلَيْهِ تُرْجَعُونَ ﴿٢٤٥﴾



(٢٣٨) کەمتەرخەمی مەکەن و پارێزگاری لە ئەنجامدانی نوێژەکاندا بکەن بەتایبەتی نوێژی ناوەند (کە نوێژی عەسرە) هەمیشەو بەردەوامیش هەستن بە ئەنجامدانی فەرمانەکان بۆ خوا بەگەردن کەچیەوە.

(٢٣٩) ئینجا ئەگەر ترسان (کە نوێژەکەتان وەکو پێویست ئەنجام نەدەن بەهۆی جەنگ یان مەترسیەکەوە) دەتوانن بەدەم ڕۆیشتنەوە یان بە سواریی ئەنجامی بدەن، هەرکاتێک ئەمین بوونەوە و هەستتان بە هێمنی کرد، ئینجا یادی خوا بکەن و (نوێژەکانتان بەچاکی ئەنجام بدەن) بەو شێوەیەی کە فێری کردوون پێشتر نەتاندەزانی.

(٢٤٠) ئەو پیاوانەتان کە دەمرن وهاوسەران بەجێ دەهێڵن، (دەبێت بەفەرمانی خوا) وەسیەت بکەن بۆ هاوسەرانیان کە تا ساڵێک لە ماڵی هاوسەریاندا ڕێزیان لێبگیرێت و بەخێو بکرێن و دەرنەکرێن، خۆ ئەگەر بەویستی خۆیان دەرچوون ئەوە ئیتر هیچ گوناهتان لەسەرنی‌یە ئەی کەس و کاری ژن کە ڕێ بدەن ئەو ئافرەتانە بچنەوە دۆخی جارانیان لەوەی کە شەرع حەلاڵیکردووە بۆیان پێش عیددە، دڵنیاش بن کە خوا باڵادەستە (ئەگەر ستەمیان لێبکەن)و دانایە (لە ڕێنموویی و دانانی سنوورەکانیدا).

(٢٤١) بۆ ژنانی تەڵاقدراو بڕێک سامان و پارە پێویستە لەسەر پیاوانی لە خواترس و پارێزکار.

(٢٤٢) ئا بەو شێوەیە خوا فەرمانەکانی خۆیتان بۆ ڕوون دەکاتەوە (دەربارەی مافی ژنان) بۆ ئەوەی ژیربن و بیرو هۆشتان بخەنەکار.

(٢٤٣) ئایا نەتبیستووە و نەتڕوانیوەتە ئەوانەی لە ترسی مردن لە ماڵ و شوێنەواریان دەرچوون، لەکاتێکدا کە هەزارەها کەسیش بوون، (ترسان لە بەرەنگار بوونەوەی دوژمن)، خوایش فەرمووی پێیان: بمرن ! (دوای ئەوەی مردن) پاشان زیندووی کردنەوە (تا بزانن ڕاکردن و خۆشاردنەوە لە جیهادو بەرەنگار بوونەوەی دوژمن مانای ڕزگار بوون لە مردن نیە)، بەڕاستی خوا خاوەنی چاکەو بەخشش و فەزڵی زۆرە بەسەر خەڵکییەوە (چاوپۆشی لە کەم تەرخەمییان دەکات و مۆڵەتیان دەدات)، هەر چەندە زۆربەی خەڵکی سوپاسی خواناکەن و سپڵەن.

(٢٤٤) (کەواتە ئیتر مەترسن و) لە ڕێگەی خوادا بجەنگن، چاک بزانن و دڵنیابن بەڕاستی خوا بیسەرو زانایە (بە هەموو گفتوگۆو هەوڵ و کۆشش و چالاکی و جیهادو خەباتتان).

(٢٤٥) کێیە ئەو کەسە قەرز دەدات بەخوای پەروەردگار بە قەرزێکی چاک (بەخشراوەکە لە ماڵی حەڵاڵ و بێ منەت و نازدار بێت)، خوایش بەو هۆیەوە بۆی چەند بەرامبەر دەکات و پاداشتی بێ سنووری پێ دەبەخشێت، (بەڕاستی خوایەکی بەرێزو دلۆڤانمان هەیە، جێگەی سەرسوڕمان و سەرنجە ئەوشێوازەی کە هانی ئیماندارانی پێ دەدات، بۆ بەخشین بە یەکتری بۆ بەخشین بۆ ڕزگاریی گرۆی ئادەمیزاد)، خوایش ڕزق و ڕۆزیی و دەرامەت دەگرێتەوە و فراوانی دەکات (بە حیکمەت و ویستی خۆی) هەر بۆ لای ئەو زاتەش دەگەڕێنەوە.

أَلَمْ تَرَ إِلَى ٱلْمَلَإِ مِنۢ بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ مِنۢ بَعْدِ مُوسَىٰٓ إِذْ قَالُوا۟ لِنَبِىٍّ لَّهُمُ ٱبْعَثْ لَنَا مَلِكًا نُّقَٰتِلْ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ ۖ قَالَ هَلْ عَسَيْتُمْ إِن كُتِبَ عَلَيْكُمُ ٱلْقِتَالُ أَلَّا تُقَٰتِلُوا۟ ۖ قَالُوا۟ وَمَا لَنَآ أَلَّا نُقَٰتِلَ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ وَقَدْ أُخْرِجْنَا مِن دِيَٰرِنَا وَأَبْنَآئِنَا ۖ فَلَمَّا كُتِبَ عَلَيْهِمُ ٱلْقِتَالُ تَوَلَّوْا۟ إِلَّا قَلِيلًا مِّنْهُمْ ۗ وَٱللَّهُ عَلِيمٌۢ بِٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٢٤٦﴾ وَقَالَ لَهُمْ نَبِيُّهُمْ إِنَّ ٱللَّهَ قَدْ بَعَثَ لَكُمْ طَالُوتَ مَلِكًا ۚ قَالُوٓا۟ أَنَّىٰ يَكُونُ لَهُ ٱلْمُلْكُ عَلَيْنَا وَنَحْنُ أَحَقُّ بِٱلْمُلْكِ مِنْهُ وَلَمْ يُؤْتَ سَعَةً مِّنَ ٱلْمَالِ ۚ قَالَ إِنَّ ٱللَّهَ ٱصْطَفَىٰهُ عَلَيْكُمْ وَزَادَهُۥ بَسْطَةً فِى ٱلْعِلْمِ وَٱلْجِسْمِ ۖ وَٱللَّهُ يُؤْتِى مُلْكَهُۥ مَن يَشَآءُ ۚ وَٱللَّهُ وَٰسِعٌ عَلِيمٌ ﴿٢٤٧﴾ وَقَالَ لَهُمْ نَبِيُّهُمْ إِنَّ ءَايَةَ مُلْكِهِۦٓ أَن يَأْتِيَكُمُ ٱلتَّابُوتُ فِيهِ سَكِينَةٌ مِّن رَّبِّكُمْ وَبَقِيَّةٌ مِّمَّا تَرَكَ ءَالُ مُوسَىٰ وَءَالُ هَٰرُونَ تَحْمِلُهُ ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ ۚ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَةً لَّكُمْ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ ﴿٢٤٨﴾

(٢٤٦) ئایا نەتبیستووە و نەترِوانیوەتە بەسەرهاتی دەستەیەک لە گەورە پیاوانی نەوەی ئیسرائیل لە دوای موسا لەکاتێکدا بە پێغەمبەرەکەی خۆیانیان وت: پاشایەک، سەرکردەیەکمان بۆ دیاری بکە و بینێرە تا لە پێناوی خوادا بجەنگین، پێغەمبەرەکە وتی: باشە؛ ئەی ئەگەر جەنگتان لەسەر بڕیاردراو خەریک بوو یەختان بگرێت و پەشیمان ببنەوە و نەجەنگان؟ (لە وەڵامدا) وتیان: چیمانە کە لە پێناوی خوادا نەجەنگین، لە کاتێکیشدا ئەوەتە دەربەدەرکراوین و لە ماڵ و منداڵ و وولاتمان بووین، کەچی کاتێک جەنگیان لەسەر بڕیاردرا، تەنها کەمێکیان نەبێت ئەوانی تر هەموویان پشتیان هەڵکردو پەشیمان بوونەوە، خوایش زاناو بەئاگایە بە ستەمکاران.

(٢٤٧) ئینجا پێغەمبەرەکەیان (بەوانەی کە ئامادەی جەنگ بوون) وتی: ئەوە ئیتر خوا بە ڕاستی بڕیاری داوەو طالوتی ڕەوانە کردووە کە پاشا و سەرکردەتان بێت، کەچی (هەندێکیان) وتیان: چۆن ئەو ببێتە سەرکردە بەسەرمانەوە، ئێمە شایستەترین بە سەرکردەیی لەو، ئەو ماڵ و سامانێکی زۆری نیە! (جوولەکە هەمیشە ماڵ و سامان دەکەنە پێوەر لە هەموو شتێکدا)، (پێغەمبەرەکە لە وەڵامیاندا) وتی: بەڕاستی خوا (طالوت) ی هەڵبژاردووە و پەسەندی کردووە بەسەرتانداو زانست و زانیاری زۆرو لاشەیەکی بەهێزو گەورەشی داوەتێ، خوای گەورەش پاشایەتی دەبەخشێت بە هەر کەس کە بیەوێت و (شایستە بێت)و خوا فراوانگیرو زانایە.

(٢٤٨) ئەوسا پێغەمبەرەکەیان پێی وتن: بەڕاستی نیشانەی پاشایەتی طالوت ئەوەیە: سندووقەکەتان بۆ دێتەوەو، ئاسوودەیی و ئارامی تێدایە لە لایەن پەروەردگارتانەوەیە، هەروەها هەندێک پاشماوەی بەنرخ و کەلەپوری تێدایە لەوەی کە بنەماڵەی موسا و بنەماڵەی هاروون بەجێیان هێشتووەو لەکاتێکدا کە فریشتە هەڵیدەگرن و دەیهێننەوە بۆتان، بەڕاستی هەر لەوەدا بەڵگەو نیشانەی تەواو هەیە بۆتان ئەگەر باوەڕدارن.

فَلَمَّا فَصَلَ طَالُوتُ بِالْجُنُودِ قَالَ إِنَّ اللَّهَ مُبْتَلِيكُم بِنَهَرٍ فَمَن شَرِبَ مِنْهُ فَلَيْسَ مِنِّي وَمَن لَّمْ يَطْعَمْهُ فَإِنَّهُ مِنِّي إِلَّا مَنِ اغْتَرَفَ غُرْفَةً بِيَدِهِ ۚ فَشَرِبُوا مِنْهُ إِلَّا قَلِيلًا مِّنْهُمْ ۚ فَلَمَّا جَاوَزَهُ هُوَ وَالَّذِينَ آمَنُوا مَعَهُ قَالُوا لَا طَاقَةَ لَنَا الْيَوْمَ بِجَالُوتَ وَجُنُودِهِ ۚ قَالَ الَّذِينَ يَظُنُّونَ أَنَّهُم مُّلَاقُو اللَّهِ كَم مِّن فِئَةٍ قَلِيلَةٍ غَلَبَتْ فِئَةً كَثِيرَةً بِإِذْنِ اللَّهِ ۗ وَاللَّهُ مَعَ الصَّابِرِينَ ﴿٢٤٩﴾ وَلَمَّا بَرَزُوا لِجَالُوتَ وَجُنُودِهِ قَالُوا رَبَّنَا أَفْرِغْ عَلَيْنَا صَبْرًا وَثَبِّتْ أَقْدَامَنَا وَانصُرْنَا عَلَى الْقَوْمِ الْكَافِرِينَ ﴿٢٥٠﴾ فَهَزَمُوهُم بِإِذْنِ اللَّهِ وَقَتَلَ دَاوُودُ جَالُوتَ وَآتَاهُ اللَّهُ الْمُلْكَ وَالْحِكْمَةَ وَعَلَّمَهُ مِمَّا يَشَاءُ ۗ وَلَوْلَا دَفْعُ اللَّهِ النَّاسَ بَعْضَهُم بِبَعْضٍ لَّفَسَدَتِ الْأَرْضُ وَلَٰكِنَّ اللَّهَ ذُو فَضْلٍ عَلَى الْعَالَمِينَ ﴿٢٥١﴾ تِلْكَ آيَاتُ اللَّهِ نَتْلُوهَا عَلَيْكَ بِالْحَقِّ ۚ وَإِنَّكَ لَمِنَ الْمُرْسَلِينَ ﴿٢٥٢﴾

(٢٤٩) ئینجا لەکاتێکدا طالوت سەربازانی جیاکردەوەو پێی وتن (وا ئێمە دەڕۆین)، بێگومان خوا (لە ڕێ گوزەرماندا) تاقیتان دەکاتەوە بە ڕووبارێک (دوای ماندوو بوون و تینوویەتی)، جا ئەوەی لێی بخواتەوە (ئەوە سەربازی) من نیە و (بگەڕێتەوە) و ئەوەی نەیچێژێت یان تەنها لوێچێک بەدەستی خۆی بخواتەوە ئەوە بەڕاستی سەربازی منە و (دەپەڕێتەوەو دەڕۆین، جا لەگەڵ ئەو ڕوون کردنەوەیەشدا) زۆربەیان (لە ئاوی ڕووبارەکەیان) خواردەوە، کەمێکیان نەبێت، جا کاتێک لێی پەڕینەوە خۆی و ئەوانەی باوەڕیان هێنابوو لەگەڵیدا (هەندێکیان) وتیان: ئەمڕۆ (زەحمەتە بەم ژمارە کەمەوە) دەرەقەتی جالوت و سەربازانی بێین، (بەڵام) ئەوانەی دڵنیا بوون بە خزمەتی پەروەردگاریان دەگەن وتیان: (مەترسن) چونکە چەندەها جار دەستەی کەم، زاڵ بوون بەسەر دەستەی زۆردا بەفەرمانی خواو خوا یارو یاوەری خۆگرو ئارامگرانە.

(٢٥٠) کاتێک لە بەرامبەر جالوت و سەربازانیەوە وەستان (نزایان کردو) وتیان: پەروەردگارا خۆگری و ئارامگریمان پێ ببەخشە، (دڵ و دەروون و) پێکانمان دامەزراو بکە و سەرمان بخە بەسەر قەوم و هۆزی بێباوەڕاندا.

(٢٥١) ئەوسا ئیتر بە فەرمانی خوا لەشکری جالوتیان بەزاند و داود (کە یەکێک بوو لە سەربازانی طالوت) جالوتی کوشت، لەوەودوا خوای گەورە پاشایەتی و دانایی پێبەخشی و هەرچی ویستی بوو فێری کرد، خۆ ئەگەر خوا هەندێک لە خەڵکی بە هەندێکی تری لەناو نەبات، هەر هەموو سەر زەوی پڕ دەبێت لە تاوان و خراپە، بەڵام خوا فەزڵ و ڕێزی زۆرە بۆ هەموو گرۆی ئادەمیزاد (بەشێوەیەکی گشتی).

(٢٥٢) ئا ئەوانەی کە باسکران ئایات و بەڵگەو موعجیزەی خوای گەورەن بەڕاستی و دروستی بەسەر تۆدا دەیخوێنینەوە و بەڕاستی تۆ (ئەی محمد ﷺ) یەکێکیت لە پێغەمبەرانی خاوەن پەیام.



۞ تِلْكَ ٱلرُّسُلُ فَضَّلْنَا بَعْضَهُمْ عَلَىٰ بَعْضٍ ۘ مِّنْهُم مَّن كَلَّمَ ٱللَّهُ ۖ وَرَفَعَ بَعْضَهُمْ دَرَجَٰتٍ ۚ وَءَاتَيْنَا عِيسَى ٱبْنَ مَرْيَمَ ٱلْبَيِّنَٰتِ وَأَيَّدْنَٰهُ بِرُوحِ ٱلْقُدُسِ ۗ وَلَوْ شَآءَ ٱللَّهُ مَا ٱقْتَتَلَ ٱلَّذِينَ مِنۢ بَعْدِهِم مِّنۢ بَعْدِ مَا جَآءَتْهُمُ ٱلْبَيِّنَٰتُ وَلَٰكِنِ ٱخْتَلَفُوا۟ فَمِنْهُم مَّنْ ءَامَنَ وَمِنْهُم مَّن كَفَرَ ۚ وَلَوْ شَآءَ ٱللَّهُ مَا ٱقْتَتَلُوا۟ وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ يَفْعَلُ مَا يُرِيدُ ﴿٢٥٣﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ أَنفِقُوا۟ مِمَّا رَزَقْنَٰكُم مِّن قَبْلِ أَن يَأْتِىَ يَوْمٌ لَّا بَيْعٌ فِيهِ وَلَا خُلَّةٌ وَلَا شَفَٰعَةٌ ۗ وَٱلْكَٰفِرُونَ هُمُ ٱلظَّٰلِمُونَ ﴿٢٥٤﴾ ٱللَّهُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ٱلْحَىُّ ٱلْقَيُّومُ ۚ لَا تَأْخُذُهُۥ سِنَةٌ وَلَا نَوْمٌ ۚ لَّهُۥ مَا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِى ٱلْأَرْضِ ۗ مَن ذَا ٱلَّذِى يَشْفَعُ عِندَهُۥٓ إِلَّا بِإِذْنِهِۦ ۚ يَعْلَمُ مَا بَيْنَ أَيْدِيهِمْ وَمَا خَلْفَهُمْ ۖ وَلَا يُحِيطُونَ بِشَىْءٍ مِّنْ عِلْمِهِۦٓ إِلَّا بِمَا شَآءَ ۚ وَسِعَ كُرْسِيُّهُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ ۖ وَلَا يَـُٔودُهُۥ حِفْظُهُمَا ۚ وَهُوَ ٱلْعَلِىُّ ٱلْعَظِيمُ ﴿٢٥٥﴾ لَآ إِكْرَاهَ فِى ٱلدِّينِ ۖ قَد تَّبَيَّنَ ٱلرُّشْدُ مِنَ ٱلْغَىِّ ۚ فَمَن يَكْفُرْ بِٱلطَّٰغُوتِ وَيُؤْمِنۢ بِٱللَّهِ فَقَدِ ٱسْتَمْسَكَ بِٱلْعُرْوَةِ ٱلْوُثْقَىٰ لَا ٱنفِصَامَ لَهَا ۗ وَٱللَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ ﴿٢٥٦﴾

(٢٥٣) ئەو پێغەمبەرانەی (باسکران) ڕێزی هەندێکیانمان داوە بەسەر هەندێکی تریاندا، هەیانە خوا گفتوگۆی (یەکسەری) لەگەڵدا کردووە (وەک موسا) و پلەوپایەی هەندێکیانی بەرز کردۆتەوە بە چەندەها پلە(وەک محمد ﷺ)و چەندەها بەڵگەی ڕوون و ئاشکرامان بەخشیووە بەعیسای کوڕی مەریەم، (وەک زیندووکردنەوەی مردوو، چاکردنەوەی نەخۆشی زگماک ..هتد بەویستی خوا) و پشتگیریشمان کردووە بە فریشتەی سرووش کە (جوبرەئیل)ە، خۆ ئەگەر خوا ویستی لەسەر بوایە (ئەو خەڵکە هەمۆوی باوەڕدار دەبوون)، دوای هاتنی پێغەمبەرەکانیان جەنگیان دژبەیەک نەدەکرد، پاش ئەوەی چەندەها بەڵگەی ئاشکرایان (لەسەردەستی پێغەمبەران) بۆ هاتبوو، بەڵام دووبەرەکی کەوتە نێوانیانەوە، هەندێکیان ئیمان و باوەڕی هێناو، هەندێکیشیان بێباوەڕ بوو، ئەگەر خوا ویستی لەسەر بوایە جەنگیان دژ بەیەک نەدەکردو یەکتریان نەدەکوشت، بەڵام خوا هەرچیەکی بوێت هەر ئەوە ئەنجام دەدات هەر ئەوە پێش دەهێنێت.

(٢٥٤) ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە لەوماڵ و سامان ودارایی و(عیلم و زانست و توانایییە)ی کە پێمان بەخشیوون؛ ببەخشن، پێش ئەوەی ڕۆژێک بێت کە کڕین و فرۆشتن ودۆستایەتی و تکاکاری تیادانیە، (ئەو ڕۆژە) بێباوەڕان هەر خۆیان لە ڕیزی ستەمکاراندان.

(٢٥٥) خوا زاتێکە جگە ئەو هیچ خوایەکی ترنیە کە شایەنی پەرستن بێت و ئەو هەمیشە زیندووە و ڕاگرو سەرپەرشتیاری (هەموو دروست کراوەکانیەتی)، نە وەنەوز دەیگرێت و نە خەو(چونکە ڕاگرو سەرپەرشتیاری بوونەوەرە)، هەرچی لە ئاسمانەکان و هەرچی لە زەویدا هەیە هەر ئەوزاتە خاوەنیانە، کێیە ئەوەی (دەتوانێت) تکا بکات لە لای ئەو، بەبێ مۆڵەتی خۆی، دەشزانێت چی لە ئێستاو داهاتوو و ڕابووردودا ڕوویداوەو ڕوودەدات، هیچ کام لە دروستکراوانی زانست و زانیاری تەواویان نیە دەربارەی زانیاری و زانستەکانی ئەو، مەگەر بەوەی کە خۆی بیەوێت فێریان بکات(ئەم پێشکەوتن و زانستەی سەردەم بەشێکی کەمن لە بەخششەکانی خوا)، فەرمانڕەوایی و دەسەڵات و زانینی ئەوزاتە هەموو ئاسمانەکان و زەوی گرتۆتەوە و پارێزگاریان بەلای خواوە هیچ گران نیە و ماندووی ناکات و هەر ئەو خوایەکی بەرزو بڵند و گەورەیە.

(٢٥٦) بەهیچ جۆرێک زۆر کردن نیە لە وەرگرتنی بیروباوەڕی ئاینی ئیسلامدا (دینداریی بەزۆر نابێت بکرێت و دین بەزۆر نادرێت بەسەر کەسدا)، چونکە بەراستی ڕێبازی چاک و دروست؛ ڕوون و ئاشکرا بووە و جیابۆتەوە لەگومڕایی و سەرکەشی، جا ئەوەی باوەڕی نەبێت بە ـ طاغوت ـ (کە بریتیە لە: هەموو ڕێگەو ڕێبازو هێزو بەرنامەو لادان و بتێک)و باوەڕی دامەزراو بهێنێت بەخوا، جا بێگومان ئەوکەسە دەستی گرتووە بە بەهێزترین هۆکاری ڕزگارییەوە، شوێن دامەزراوترین بیروباوەڕ کەوتووە، کە هیچ پسان و هەڵوەشاندنەوەیەکی بۆ نیەیە و هەمیشە پتەو و دامەزراوە، خوای گەورەش بیسەرو زانایە.

ٱللَّهُ وَلِيُّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ يُخْرِجُهُم مِّنَ ٱلظُّلُمَٰتِ إِلَى ٱلنُّورِ ۖ وَٱلَّذِينَ كَفَرُوٓا۟ أَوْلِيَآؤُهُمُ ٱلطَّٰغُوتُ يُخْرِجُونَهُم مِّنَ ٱلنُّورِ إِلَى ٱلظُّلُمَٰتِ ۗ أُو۟لَٰٓئِكَ أَصْحَٰبُ ٱلنَّارِ ۖ هُمْ فِيهَا خَٰلِدُونَ ﴿٢٥٧﴾ أَلَمْ تَرَ إِلَى ٱلَّذِى حَآجَّ إِبْرَٰهِـۧمَ فِى رَبِّهِۦٓ أَنْ ءَاتَىٰهُ ٱللَّهُ ٱلْمُلْكَ إِذْ قَالَ إِبْرَٰهِـۧمُ رَبِّىَ ٱلَّذِى يُحْىِۦ وَيُمِيتُ قَالَ أَنَا۠ أُحْىِۦ وَأُمِيتُ ۖ قَالَ إِبْرَٰهِـۧمُ فَإِنَّ ٱللَّهَ يَأْتِى بِٱلشَّمْسِ مِنَ ٱلْمَشْرِقِ فَأْتِ بِهَا مِنَ ٱلْمَغْرِبِ فَبُهِتَ ٱلَّذِى كَفَرَ ۗ وَٱللَّهُ لَا يَهْدِى ٱلْقَوْمَ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٢٥٨﴾ أَوْ كَٱلَّذِى مَرَّ عَلَىٰ قَرْيَةٍ وَهِىَ خَاوِيَةٌ عَلَىٰ عُرُوشِهَا قَالَ أَنَّىٰ يُحْىِۦ هَٰذِهِ ٱللَّهُ بَعْدَ مَوْتِهَا ۖ فَأَمَاتَهُ ٱللَّهُ مِا۟ئَةَ عَامٍ ثُمَّ بَعَثَهُۥ ۖ قَالَ كَمْ لَبِثْتَ ۖ قَالَ لَبِثْتُ يَوْمًا أَوْ بَعْضَ يَوْمٍ ۖ قَالَ بَل لَّبِثْتَ مِا۟ئَةَ عَامٍ فَٱنظُرْ إِلَىٰ طَعَامِكَ وَشَرَابِكَ لَمْ يَتَسَنَّهْ ۖ وَٱنظُرْ إِلَىٰ حِمَارِكَ وَلِنَجْعَلَكَ ءَايَةً لِّلنَّاسِ ۖ وَٱنظُرْ إِلَى ٱلْعِظَامِ كَيْفَ نُنشِزُهَا ثُمَّ نَكْسُوهَا لَحْمًا ۚ فَلَمَّا تَبَيَّنَ لَهُۥ قَالَ أَعْلَمُ أَنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ ﴿٢٥٩﴾

(٢٥٧) خوا پشت و پەنا و خاوەنی ئەو کەسانەیە باوەڕیان هێناوە، لە تاریکاییەکانی (گومان و ستەم) دەریان دەهێنێت و دەیانبات بەرەو نوورو رووناکی، ئەوانەش کە رێبازی کوفریان گرتۆتەبەر، یارمەتی دەرەکانیان تەنها - طاغوتەکانە -، لە نوورو رووناکی دەریان دەهێنن و بەرەو تاریکاییەکان دەیانبەن، ئا ئەوانە نیشتەجێی ناو ئاگری دۆزەخن و بۆ هەمیشە تیایدا دەمێننەوە..

(٢٥٨) ئایا نەتبیستووە و نەتڕوانیوەتە ئەو کەسەی دەمەقاڵەی دەکرد لەگەڵ ئیبراهیمدا ﷺ لە بارەی پەروەردگاریەوە لەبەر ئەوەی خوا پاشایەتی پێبەخشی بوو،(لە جیاتی باوەڕهێنان و سوپاسگوزاری کەچی دەمەدەمێی دەکرد لەگەڵ ئیبراهیمدا)،( ئەم لووت بەرزیەشی) کاتێک بوو بە هەواو فیزەوە پرسیویەتی لە ئیبراهیم کە پەروەردگاری تۆ کێیە؟ ئەویش لە وەڵامدا وتی: پەروەردگاری من ئەوزاتەیە کە ژیان دەبەخشێت و مردنیشی بەدەستە، (نەمروود لە وەڵامیدا) وتی: جا منیش ژیان دەبەخشم و مردنیشم بەدەستە، (ئینجا فەرمانیدا هەندێک لە نەیارانی بکوژن گوایە ئەوە دەیانمرێنێت، هەندێکیشی نەکوشت گوایە ئەوە ژیانی پێبەخشین !!)، ئەوسا ئیبراهیم وتی: بەراستی خوا خۆر لە ڕۆژهەڵاتەوە دەهێنێت جا(ئەگەر تۆ دەتوانیت) لە ڕۆژئاواوە بیهێنە، ئینجا ئەو بێباوەڕە رەنگی پەڕی و دەمکوت کراو وەڵامی نەما، بێگومان خوا هیدایەتی قەومی زاڵم و ستەمکار نادات.

(٢٥٩) یاخود وەک ئەو کەسەی تێپەڕی بەلای شارۆچکەیەکدا کە هەموو خانووەکانی بەسەر سەقفەکانیدا تەپی بوون، لەبەر خۆیەوە وتی: ئاخۆ خوای گەورە چۆن خەڵکی ئەم شارۆچکەیە دوای مردنیان زیندوو دەکاتەوە؟! (ئەو کەسە عوزەیر پێغەمبەر بوو ﷺ) یەکسەر خوای گەورە سەد ساڵ مراندی و پاشان زیندووی کردەوە و پێی فەرمووی: چەند مایتەوە؟ (عوزەیر) وتی: رۆژێک یان کەمتر لە رۆژێک ماومەتەوە،(خوا) فەرمووی: نەخێر ئەوە سەد ساڵت پێچووە، جا تەماشای خواردن و خواردنەوەکەت بکە(لەو ماوە درێژەدا) نەگۆڕاوە و تێک نەچووە، تەماشای گوێدرێژەکەشت بکە، (بۆیە ئەمەمانکرد) تا بەم بەسەرهاتە بتکەینە موعجیزە بۆ خەڵکی، جا سەیری ئێسکەکانی (گوێدرێژەکەت بکە)چۆن بەرزیان دەکەینەوە و بەیەکەوەیان دەبەستین و پاشان بەگۆشت دایاندەپۆشین، کاتێک بینی و بۆی دەرکەوت وتی: چاک دەزانم و دڵنیام بەراستی خوا دەسەڵاتی بەسەر هەموو شتێکدا هەیە.

وَإِذۡ قَالَ إِبۡرَٰهِـۧمُ رَبِّ أَرِنِي كَيۡفَ تُحۡيِ ٱلۡمَوۡتَىٰۖ قَالَ أَوَلَمۡ تُؤۡمِنۖ قَالَ بَلَىٰ وَلَٰكِن لِّيَطۡمَئِنَّ قَلۡبِيۖ قَالَ فَخُذۡ أَرۡبَعَةٗ مِّنَ ٱلطَّيۡرِ فَصُرۡهُنَّ إِلَيۡكَ ثُمَّ ٱجۡعَلۡ عَلَىٰ كُلِّ جَبَلٖ مِّنۡهُنَّ جُزۡءٗا ثُمَّ ٱدۡعُهُنَّ يَأۡتِينَكَ سَعۡيٗاۚ وَٱعۡلَمۡ أَنَّ ٱللَّهَ عَزِيزٌ حَكِيمٞ ﴿٢٦٠﴾ مَّثَلُ ٱلَّذِينَ يُنفِقُونَ أَمۡوَٰلَهُمۡ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ كَمَثَلِ حَبَّةٍ أَنۢبَتَتۡ سَبۡعَ سَنَابِلَ فِي كُلِّ سُنۢبُلَةٖ مِّاْئَةُ حَبَّةٖۗ وَٱللَّهُ يُضَٰعِفُ لِمَن يَشَآءُۚ وَٱللَّهُ وَٰسِعٌ عَلِيمٌ ﴿٢٦١﴾ ٱلَّذِينَ يُنفِقُونَ أَمۡوَٰلَهُمۡ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ ثُمَّ لَا يُتۡبِعُونَ مَآ أَنفَقُواْ مَنّٗا وَلَآ أَذٗى لَّهُمۡ أَجۡرُهُمۡ عِندَ رَبِّهِمۡ وَلَا خَوۡفٌ عَلَيۡهِمۡ وَلَا هُمۡ يَحۡزَنُونَ ﴿٢٦٢﴾ ۞ قَوۡلٞ مَّعۡرُوفٞ وَمَغۡفِرَةٌ خَيۡرٞ مِّن صَدَقَةٖ يَتۡبَعُهَآ أَذٗىۗ وَٱللَّهُ غَنِيٌّ حَلِيمٞ ﴿٢٦٣﴾ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تُبۡطِلُواْ صَدَقَٰتِكُم بِٱلۡمَنِّ وَٱلۡأَذَىٰ كَٱلَّذِي يُنفِقُ مَالَهُۥ رِئَآءَ ٱلنَّاسِ وَلَا يُؤۡمِنُ بِٱللَّهِ وَٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِۖ فَمَثَلُهُۥ كَمَثَلِ صَفۡوَانٍ عَلَيۡهِ تُرَابٞ فَأَصَابَهُۥ وَابِلٞ فَتَرَكَهُۥ صَلۡدٗاۖ لَّا يَقۡدِرُونَ عَلَىٰ شَيۡءٖ مِّمَّا كَسَبُواْۗ وَٱللَّهُ لَا يَهۡدِي ٱلۡقَوۡمَ ٱلۡكَٰفِرِينَ ﴿٢٦٤﴾



(٢٦٠) بە یاد بهێنـە، کـاتێک ئیـبراهیم وتـی: پەروەردگارا نیشـانم بـدە چۆن مـردوو زینـدوو دەکەیتـەوە؟ خـوا فـەرمووی: ئایـا بـاوەڕت نەهێناوە؟ ئیبراهیم وتی: بـەڵێ (بـاوەڕم هەیـە) بەڵام حەزدەکەم (بـەچاوی خۆم ببینـم) تـا دڵـم ئارام بگرێت، خـوا فـەرمووی: جا کەواتـە چـوار باڵندە بهێنەو جوان سەرنجیان بدەو دوایـی هـەر چواریان سەربڕەو گۆشت و پەڕ و خوێنیان تێکـەڵ بکـە، ئەوسا لەسـەر لوتکـەی هـەر شـاخێک هەندێک لەو تێکەڵەیـە دابنـێ، پاشـان بانگیـان بکە، بەگورجی و بەپەلـە هـەموویان دێنـەوە بـۆ لات و چـاک بزانـە و دڵنیابـە بەراسـتی خـوا باڵادەست و کار بەجێیە.

(٢٦١) نمونـەی ئەوانـەی کـە مـاڵ و سـامانیان دەبەخشن لە پێناوی‌خوادا، وەکو تۆوێک وایە کە بڕوێت و حەوت گوڵی گرتبێت، لە هـەر گوڵێکـدا سەد دانەی تیادا بێت، خوایش بۆ هەر کـەس کـە بیـەوێت (بـە گوێـرەی نیـەتی و جێگرتنـی خێرەکەی) پاداشت چەند بەرامبەر دەکات و خوا فراوانگیر و زانایە.

(٢٦٢) ئەوانـەی مـاڵ و دارایـیان دەبەخشـن لـە ڕێگەی خوادا، بەدوای ئەوەی بەخشیوویانە هیچ جۆرە منەتێک نانێن و هیچ جۆرە ئازارێک ناگەیەنن، (ئەوانە) تەنها پاداشتیان لای پەروەردگاریانـە، هیـچ تـرس و بیمیان لەسەرنیە (لە کەم و کووڕیی پاداشت و تەنگانەی قیامەت)، غەم و پەژارەش روویان تێ ناکات.

(٢٦٣) قسەو گـوفتاری جوان و چاوپۆشیەک (لە هەڵە)، چاکترە لە بەخشینێک کە ئـازاری بـەدوادا بێـت و منـەت بکرێت، خوایش دەوڵەمەندو بێ نیـازە (لـە بەخشـینی بەمنـەت) و خۆڕاگرو لـەسەرخـۆیە (زوو تۆڵە ناسێنێت لە سەرکەش و یاخییەکان).

(٢٦٤) ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە، نەکەن خێرو پاداشتی چاکەکانتان پووچ بکەنەوە بە منـەت نـان و دڵ ئـازاردانی (هەژاران)، وەکو ئەو کەسەی ماڵ و سامانی خۆی لەبەر چاوی خەڵکی ببەخشێت بۆ ریاکاریی و خۆنوانـدن و ئیمـان و باوەڕی بەخواو رۆژی دوایی نەبێت، جا نموونەی ئەو جۆرە کەسانە وەک بەردێکی ساف وایە کە خۆڵێکـی بـە سـەرەوە بێت، لەوەودوا بارانێکی لێزمە ببـارێت بەسـەریداو هیچی بەسـەرەوە نـەهێڵێت و بـەرەق و تـەقی بـەجێی بـهێڵێت و حەقیقەتی دەربکەوێت، (ئینجا ئـەو جـۆرە ریابـازو بێ‌بـاوەڕ منەتنەرانـە) هیـچ جۆرە بەهرەیـەک لـەو بەخشـینەیان بەدەست ناهێنن، بێگومان خوای گەورە رێنموویی قەومی بێ باوەڕو کافران ناکات.

وَمَثَلُ ٱلَّذِينَ يُنفِقُونَ أَمْوَٰلَهُمُ ٱبْتِغَآءَ مَرْضَاتِ ٱللَّهِ وَتَثْبِيتًا مِّنْ أَنفُسِهِمْ كَمَثَلِ جَنَّةٍۭ بِرَبْوَةٍ أَصَابَهَا وَابِلٌ فَـَٔاتَتْ أُكُلَهَا ضِعْفَيْنِ فَإِن لَّمْ يُصِبْهَا وَابِلٌ فَطَلٌّ ۗ وَٱللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ ﴿٢٦٥﴾ أَيَوَدُّ أَحَدُكُمْ أَن تَكُونَ لَهُۥ جَنَّةٌ مِّن نَّخِيلٍ وَأَعْنَابٍ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ لَهُۥ فِيهَا مِن كُلِّ ٱلثَّمَرَٰتِ وَأَصَابَهُ ٱلْكِبَرُ وَلَهُۥ ذُرِّيَّةٌ ضُعَفَآءُ فَأَصَابَهَآ إِعْصَارٌ فِيهِ نَارٌ فَٱحْتَرَقَتْ ۗ كَذَٰلِكَ يُبَيِّنُ ٱللَّهُ لَكُمُ ٱلْـَٔايَٰتِ لَعَلَّكُمْ تَتَفَكَّرُونَ ﴿٢٦٦﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ أَنفِقُوا۟ مِن طَيِّبَٰتِ مَا كَسَبْتُمْ وَمِمَّآ أَخْرَجْنَا لَكُم مِّنَ ٱلْأَرْضِ ۖ وَلَا تَيَمَّمُوا۟ ٱلْخَبِيثَ مِنْهُ تُنفِقُونَ وَلَسْتُم بِـَٔاخِذِيهِ إِلَّآ أَن تُغْمِضُوا۟ فِيهِ ۚ وَٱعْلَمُوٓا۟ أَنَّ ٱللَّهَ غَنِىٌّ حَمِيدٌ ﴿٢٦٧﴾ ٱلشَّيْطَٰنُ يَعِدُكُمُ ٱلْفَقْرَ وَيَأْمُرُكُم بِٱلْفَحْشَآءِ ۖ وَٱللَّهُ يَعِدُكُم مَّغْفِرَةً مِّنْهُ وَفَضْلًا ۗ وَٱللَّهُ وَٰسِعٌ عَلِيمٌ ﴿٢٦٨﴾ يُؤْتِى ٱلْحِكْمَةَ مَن يَشَآءُ ۚ وَمَن يُؤْتَ ٱلْحِكْمَةَ فَقَدْ أُوتِىَ خَيْرًا كَثِيرًا ۗ وَمَا يَذَّكَّرُ إِلَّآ أُو۟لُوا۟ ٱلْأَلْبَٰبِ ﴿٢٦٩﴾

(٢٦٥) نموونـەی ئەوانـەی مـاڵ و سـامانیان دەبەخشـن لـە پێناوی بەدەستهێنانی ڕەزامـەندی خوادا و بۆ دامـەزراندن و راهێنـانی خۆیـان لەسـەر چاکەکاری، وەکو باخچەیەک وایە: لـە بەرزاییـەکدا بێت و بارانێکی دڵـۆپ گـەورە بیگرێتـەوە و ببێتـە هۆی ئەوەی کە دوو بەرامبەر بەرهەمی هەبێت، خۆ ئەگەر بارانی دڵۆپ گەورەش نەیگرێتەوە، ئەوە نمە باران پاراوی دەکـات، خـوای گـەورەش بینایـە بـەو کارو کردەوانەی دەیکەن.

(٢٦٦) ئایـا هیـچ کـەس لـە ئێـوە حـەز دەکـات باخێکی هەبێت لە دارخورماو چەندەها جـۆر ڕەزە ترێ پێک هاتبێت و چەند جۆگـەو ڕووبارێک بەژێر درەختەکانیدا بڕوات و هـەموو جۆرە بەروبوومێکی تێدا بێت بـۆ خـاوەنەکەی وخۆی دووچاری پـیری بووبێت و چـەند نـەوەو منداڵێکـی لاوازی هـەبێت، کەچی لەناکاو گەردەلولێک گڕوگەرمیەکی بەهێزی تێدابێـت وهەڵکاتەسـەری و یەکسەربسـووتێت؟! (ئەمە زۆرجێی داخ‌ونیگەرانیە چونکە نەخۆی لەبەر پـیری، نەمنـداڵی، لـەبـەر بـێ هـێزی، نـاتوانن باخەکـە ئـاوەدان بکەنـەوە)، ئـا بـەو شـێوەیە خـوا ئایەتـو بـەڵگەو نیشانـەکان دەخاتە بـەرچاوتان بـۆ ئەوەی تێفکرن و بیربکەنەوە (خۆتان مایەپووچ و ڕەنج بەخەسـار نەکەن).

(٢٦٧) ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە: ببەخشن لە باشترین بەروبووم و بەرهەمێک کە بەدەستان هێناوە و لەو بەروبوومانەی کە لە زەویدا بۆمان دەرهێناون و ڕواندوومانە، نەکەن نیازی بەخشینی شـتی نـاپوخت و بـێ کـەڵک بکـەن و لـەو ببەخشـن، لەکاتێکدا خۆتان ئەو جۆرە شتانە وەرناگرن و پێی رازی نابن (ئەگەر بتاندرێتێ) مەگەر چاوی لێ بنوقێنن و بزانـن کـە خوا دەوڵەمەندو بێ‌نیازە و شایستەی سوپاسە (پێویستی بەبەخشینی بێ نرخ نیە).

(٢٦٨) (کاتێ ئێوە لە ماڵ و داراییتـان دەبەخشـن) شـەیتان بـەڵێنی هـەژاری و نـەداریتان پـێ دەدات (دەتانترسـێنێت بـە هەژاری) و فەرمانتان پێ دەدات بەگوناهو تاوان وخراپە و نەبەخشین، خـوای گـەورەش بـەڵێنی لێخۆش بوونێکـی تایبـەتی خۆیتان پێدەدات لەگەڵ زۆری ڕۆزی و بەهرەی فراوانداو خوا فراوانگیرو زانایە.

(٢٦٩) ئەوزاتە بەهەر کەس بیەوێت و (شایستە بێت) حیکمەت و دانایی پێ دەبەخشێت و هەر کەس حیکمـەتی پـێ ببەخشرێت، ئەوە بێگومـان خێرێکی زۆری پێدراوە، جـا بێجگـە لـە ژیـر و هۆشـمەندەکان کەسـانی تـر لـەو بەهرەیـە تێناگەن و پەند وەرناگرن.

وَمَآ أَنفَقْتُم مِّن نَّفَقَةٍ أَوْ نَذَرْتُم مِّن نَّذْرٍ فَإِنَّ ٱللَّهَ يَعْلَمُهُۥ ۗ وَمَا لِلظَّٰلِمِينَ مِنْ أَنصَارٍ ﴿٢٧٠﴾ إِن تُبْدُوا۟ ٱلصَّدَقَٰتِ فَنِعِمَّا هِىَ ۖ وَإِن تُخْفُوهَا وَتُؤْتُوهَا ٱلْفُقَرَآءَ فَهُوَ خَيْرٌ لَّكُمْ ۚ وَيُكَفِّرُ عَنكُم مِّن سَيِّـَٔاتِكُمْ ۗ وَٱللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرٌ ﴿٢٧١﴾ ۞ لَّيْسَ عَلَيْكَ هُدَىٰهُمْ وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ يَهْدِى مَن يَشَآءُ ۗ وَمَا تُنفِقُوا۟ مِنْ خَيْرٍ فَلِأَنفُسِكُمْ ۚ وَمَا تُنفِقُونَ إِلَّا ٱبْتِغَآءَ وَجْهِ ٱللَّهِ ۚ وَمَا تُنفِقُوا۟ مِنْ خَيْرٍ يُوَفَّ إِلَيْكُمْ وَأَنتُمْ لَا تُظْلَمُونَ ﴿٢٧٢﴾ لِلْفُقَرَآءِ ٱلَّذِينَ أُحْصِرُوا۟ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ لَا يَسْتَطِيعُونَ ضَرْبًا فِى ٱلْأَرْضِ يَحْسَبُهُمُ ٱلْجَاهِلُ أَغْنِيَآءَ مِنَ ٱلتَّعَفُّفِ تَعْرِفُهُم بِسِيمَٰهُمْ لَا يَسْـَٔلُونَ ٱلنَّاسَ إِلْحَافًا ۗ وَمَا تُنفِقُوا۟ مِنْ خَيْرٍ فَإِنَّ ٱللَّهَ بِهِۦ عَلِيمٌ ﴿٢٧٣﴾ ٱلَّذِينَ يُنفِقُونَ أَمْوَٰلَهُم بِٱلَّيْلِ وَٱلنَّهَارِ سِرًّا وَعَلَانِيَةً فَلَهُمْ أَجْرُهُمْ عِندَ رَبِّهِمْ وَلَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ ﴿٢٧٤﴾



(٢٧٠) هەر شتێکتان بەخشی بێت یان هەر نەزرو بڕیارێکتان دابێت، ئەوە خوا پێی دەزانێت و بۆ ستەمکاران هیچ جۆرە پشتیوانیەک نیە (کە بیانپارێزێ لە تۆڵەی خوا).

(٢٧١) ئەگەر خێرو چاکە و بەخشینەکانتان بە ئاشکرا ئەنجام بدەن ئەوە شتێکی چاکە، خۆ ئەگەر بیشارنەوە و بیدەن بە هەژاران بە نهێنی ئەوە چاکترە بۆتان، جا (بەو بەخشینە) خوا هەندێک لە گوناهەکانتان دەسڕێتەوە و خوا ئاگایە بەو کارو کردەوانەی کە ئەنجامی دەدەن.

(٢٧٢) ئەی پێغەمبەر ﷺ هیدایەت و ڕێنمویی و موسوڵمان کردنی ئەو خەڵکە لەسەر تۆ نیە (چونکە تۆ تەنها گەیاندنی پەیامەکەت لەسەرە) بەڵام خوا هیدایەت و ڕێنمویی هەر کەسێکی بوێت دەکات، (بە مەرجێک ئەو کەسەش رووی دڵی بکاتە ئیمان) هەر خێرێکیش ئەنجام بدەن، ئەوە قازانجەکەی بۆ خۆتانە، ئێوە (ئەی بڕواداران) هیچ شتێک نابەخشن مەگەر بۆ ڕەزامەندی خوا نەبێت و هەر خێرو چاکەیەکیش ئەنجام بدەن پاداشتەکەیتان دەستتان دەکەوێتەوە، ئەوسا ئێوە بەهیچ شێوەیەک ستەمتان لێناکرێت.

(٢٧٣) (ئەو جۆرە بەخشینانە پێشکەش بکەن) بەو هەژارانەی لە پێناوی خوادا لێبڕاون و ناتوانن بگەڕێن بە زەویدا و بازرگانی و کاسبی بکەن (بەهۆی خەریک بوونیان بەگەیاندنی پەیامی خوا)، ئەوەی نەیانناسێت، (ئەو هەژارانە ئەوەندە کەسایەتی خۆیان ڕادەگرن و نەفس بەرزن)، وادەزانێت دەوڵەمەندن، تۆ ئەی پێغەمبەر ﷺ (یا ئەی ئیماندار) بە ڕەنگ و ڕوخسارو سیمایاندا دەیانناسیت، داواناکەن لەخەڵکی بەزۆر شتی لێبسەنن و رووگیریان بکەن، هەر خێرێک ئەنجام بدەن ئەوە بێگومان خوا زانایە پێی.

(٢٧٤) ئەوانەی ماڵ و سامانیان دەبەخشن، بەشەو و بە ڕۆژ، بە نهێنی و بە ئاشکرا، ئا ئەوانە هەر پاداشتیان لای پەروەردگاریانە، ترس و بیمیان لەسەر نییە و ئەوان خەفەتبار نابن (لە ڕۆژی قیامەت و لێپرسینەوەدا).

ٱلَّذِينَ يَأْكُلُونَ ٱلرِّبَوٰاْ لَا يَقُومُونَ إِلَّا كَمَا يَقُومُ ٱلَّذِى يَتَخَبَّطُهُ ٱلشَّيْطَٰنُ مِنَ ٱلْمَسِّ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ قَالُوٓاْ إِنَّمَا ٱلْبَيْعُ مِثْلُ ٱلرِّبَوٰاْ وَأَحَلَّ ٱللَّهُ ٱلْبَيْعَ وَحَرَّمَ ٱلرِّبَوٰاْ فَمَن جَآءَهُۥ مَوْعِظَةٌ مِّن رَّبِّهِۦ فَٱنتَهَىٰ فَلَهُۥ مَا سَلَفَ وَأَمْرُهُۥٓ إِلَى ٱللَّهِ وَمَنْ عَادَ فَأُوْلَٰٓئِكَ أَصْحَٰبُ ٱلنَّارِ هُمْ فِيهَا خَٰلِدُونَ ﴿٢٧٥﴾ يَمْحَقُ ٱللَّهُ ٱلرِّبَوٰاْ وَيُرْبِى ٱلصَّدَقَٰتِ وَٱللَّهُ لَا يُحِبُّ كُلَّ كَفَّارٍ أَثِيمٍ ﴿٢٧٦﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ وَأَقَامُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتَوُاْ ٱلزَّكَوٰةَ لَهُمْ أَجْرُهُمْ عِندَ رَبِّهِمْ وَلَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ ﴿٢٧٧﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَذَرُواْ مَا بَقِىَ مِنَ ٱلرِّبَوٰٓاْ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ ﴿٢٧٨﴾ فَإِن لَّمْ تَفْعَلُواْ فَأْذَنُواْ بِحَرْبٍ مِّنَ ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ وَإِن تُبْتُمْ فَلَكُمْ رُءُوسُ أَمْوَٰلِكُمْ لَا تَظْلِمُونَ وَلَا تُظْلَمُونَ ﴿٢٧٩﴾ وَإِن كَانَ ذُو عُسْرَةٍ فَنَظِرَةٌ إِلَىٰ مَيْسَرَةٍ وَأَن تَصَدَّقُواْ خَيْرٌ لَّكُمْ إِن كُنتُمْ تَعْلَمُونَ ﴿٢٨٠﴾ وَٱتَّقُواْ يَوْمًا تُرْجَعُونَ فِيهِ إِلَى ٱللَّهِ ثُمَّ تُوَفَّىٰ كُلُّ نَفْسٍ مَّا كَسَبَتْ وَهُمْ لَا يُظْلَمُونَ ﴿٢٨١﴾

(٢٧٥) ئەوانەی سوو دەخۆن، هەڵسوکەوت ناکەن و راست نابنەوە (لە گۆردا) مەگەر وەک ئەو کەسەی کە شەیتان دەستی لێوەشاندبێت (هەر لە دنیادا سروشتی نین، لە قیامەتیشدا وەک شێت دەبن) چونکە ئەوانە دەڵێن: کڕین و فرۆشتن وەک سوو وایە (لە حاڵێکدا): خوا کڕین و فرۆشتنی حەلاڵ کردووەو سووی حەرام کردووە، جا ئەوەی ئامۆژگاری پەروەردگاری پێگەیشت و وازی هێنا، ئەوەی دەستی کەوتووە، بۆ خۆی، کاری (لێ پرسینەوەشی) دەکەوێتە لای خوا، بەلام ئەوەی دەست بکاتەوە بەسوو خۆریی، ئا ئەوانە جێنشینی ناو ئاگری دۆزەخن و ژیانی هەمیشەیی تیادا دەبەنەسەر.

(٢٧٦) خوا، سوو، تەفروتونا دەکات و بەرەکەتی لێ هەڵدەگرێت، بەلام پاداشتی خێر و سامان بەخشین بەرەو پێ دەدات و بەرەکەتی تێ دەخات بێگومان خوا هیچ کافرێکی تاوانباری خۆشناوێت.

(٢٧٧) بەڕاستی ئەوانەی کە باوەڕیان هێناوە و کردەوە چاکەکانیان ئەنجامداوە و نوێژەکانیان بەچاکی بەجێهێناوە و زەکاتیان داوە، تەنها پاداشتیان لای پەروەردگاریانە، ئەوسا نە ترس و بیمیان لەسەرە، نەغەم و پەژارە دەیان گرێتەوە.

(٢٧٨) ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە، پارێزکارو خواناس بن و واز لە پاشماوەی سوو بهێنن ئەگەر ئیماندارن.

(٢٧٩) خۆ ئەگەر وا نەکەن، ئەوە جەنگ لەگەڵ خواو پێغەمبەرەکەیدا رابگەیەنن (کە سەرئەنجامەکەی زۆر سامناکە)، خۆ ئەگەر تەوبە بکەن و (لە سوو خۆری واز بهێنن) ئەوە تەنها سەرمایەکانتان بۆ هەیە وەری بگرنەوە، نە ستەم دەکەن (لە قەرزارەکان)، نە ستەمتان لێ دەکرێت.

(٢٨٠) خۆ ئەگەر قەرزارەکە نەدار بوو، ئەوە مۆڵەتی بدرێ تا دەرووی لێ دەکرێتەوە و دەیبێت، خێر کردنتان بە قەرزارەکە و ئازاد کردنی و بەخشینی، چاکترە بۆتان ئەگەر ئێوە بزانن (چەندە پاداشتی خوایی بێ سنوورە).

(٢٨١) (خەڵکینە) لە سزاو تۆڵەی رۆژێک بترسن کە تیایدا بۆ لای خوا دەگەڕێنەوە، لەوەودوا هەموو کەس پاداشتی کاروکردەوەی خۆی وەردەگرێت و ستەمیان لێ ناکرێت.

يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا تَدَايَنتُم بِدَيۡنٍ إِلَىٰٓ أَجَلٖ مُّسَمّٗى فَٱكۡتُبُوهُۚ وَلۡيَكۡتُب بَّيۡنَكُمۡ كَاتِبُۢ بِٱلۡعَدۡلِۚ وَلَا يَأۡبَ كَاتِبٌ أَن يَكۡتُبَ كَمَا عَلَّمَهُ ٱللَّهُۚ فَلۡيَكۡتُبۡ وَلۡيُمۡلِلِ ٱلَّذِي عَلَيۡهِ ٱلۡحَقُّ وَلۡيَتَّقِ ٱللَّهَ رَبَّهُۥ وَلَا يَبۡخَسۡ مِنۡهُ شَيۡـٔٗاۚ فَإِن كَانَ ٱلَّذِي عَلَيۡهِ ٱلۡحَقُّ سَفِيهًا أَوۡ ضَعِيفًا أَوۡ لَا يَسۡتَطِيعُ أَن يُمِلَّ هُوَ فَلۡيُمۡلِلۡ وَلِيُّهُۥ بِٱلۡعَدۡلِۚ وَٱسۡتَشۡهِدُواْ شَهِيدَيۡنِ مِن رِّجَالِكُمۡۖ فَإِن لَّمۡ يَكُونَا رَجُلَيۡنِ فَرَجُلٞ وَٱمۡرَأَتَانِ مِمَّن تَرۡضَوۡنَ مِنَ ٱلشُّهَدَآءِ أَن تَضِلَّ إِحۡدَىٰهُمَا فَتُذَكِّرَ إِحۡدَىٰهُمَا ٱلۡأُخۡرَىٰۚ وَلَا يَأۡبَ ٱلشُّهَدَآءُ إِذَا مَا دُعُواْۚ وَلَا تَسۡـَٔمُوٓاْ أَن تَكۡتُبُوهُ صَغِيرًا أَوۡ كَبِيرًا إِلَىٰٓ أَجَلِهِۦۚ ذَٰلِكُمۡ أَقۡسَطُ عِندَ ٱللَّهِ وَأَقۡوَمُ لِلشَّهَٰدَةِ وَأَدۡنَىٰٓ أَلَّا تَرۡتَابُوٓاْ إِلَّآ أَن تَكُونَ تِجَٰرَةً حَاضِرَةٗ تُدِيرُونَهَا بَيۡنَكُمۡ فَلَيۡسَ عَلَيۡكُمۡ جُنَاحٌ أَلَّا تَكۡتُبُوهَاۗ وَأَشۡهِدُوٓاْ إِذَا تَبَايَعۡتُمۡۚ وَلَا يُضَآرَّ كَاتِبٞ وَلَا شَهِيدٞۚ وَإِن تَفۡعَلُواْ فَإِنَّهُۥ فُسُوقُۢ بِكُمۡۗ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَۖ وَيُعَلِّمُكُمُ ٱللَّهُۗ وَٱللَّهُ بِكُلِّ شَيۡءٍ عَلِيمٞ ﴿٢٨٢﴾

(٢٨٢) ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە ئەگەر قەرزێکتان کرد لە یەکتر تا ماوەیەکی دیاری کراو، ئەوە بینوسن و با نووسەرێک کە دادپەروەربێت بەراستی و دروستی لە نێوانتاندا بینوسێت، با هیچ نوسەرێک سەرپێچی نەکات لە نوسین، هەر وەک چۆن خوا فێری کردووە با بنووسێت، (خۆ ئەگەر کەسێک خوێندەوار نەبێت) ئەوەی کە حەقەکەی بەسەرەوەیە و قەرزەکەی لایە با بەدەمی خۆی (ئەندازەی قەرزەکەی) بە کاتبەکە بڵێت و لە خوای پەروەردگاری بترسێت و چاوپۆشی لە هیچی نەکات و لێی کەم نەکاتەوە، خۆ ئەگەر ئەوەی قەرزەکەی لەسەرە هەڵەشە بوو، یا لاواز بوو (منداڵ یان بەساڵاچوو بوو) یا نەیدەتوانی دان بە حەقەکەدا بنێت (کەرولاڵ بوو) با بەخێوکەر، یا سەرپەرشتیارەکەی دادگەرانە حەقیقەت و راستی قەرزەکەی بڵێت و با دوو پیاو لە خۆتان شایەتی لەسەر(قەرزو مامەڵـە) بگرن، ئەگەر دووپیاو دەستنەکەوتن بۆ شایەتی، با پیاوێک و دوو ئافرەت شایەتییەکە بدەن لەو کەسانەی کە رازین بە شایەتیدانیان، نەوەکو یەکێک لە(ئافرەتەکان) بیری بچێت، با ئەوی تریان بیری بهێنێتەوە و شایەتەکان نابێت کە کاتێک داواکران خۆ وێڵ بکەن و ئامادە نەبن، بێزار مەبن لەوەی کە(قەرز) بنووسن، کەم بێت یان زۆر و تا ماوەی دیاری کراوی، بە روونی با یاداشت بکرێت، ئەنجامدانی مەسەلەی قەرزتان بەو شێوە دادپەروەرانەیە و پەسەندترە لای خوا (لە نەنووسین)، ئەوسا چاکتر دەتوانن شایەتی راگرن و نزیکترن لەوەی گومان و دوودڵی بە یەکتر نەبەن(مافی کەس تیا نەچێت)، مەگەر بازرگانیەک بێت لەبەر دەستانداو لە نێو خۆتاندا بیگێڕن و کڕین و فرۆشتن ئەنجام بدەن، ئەوە گوناهتان ناگات کە نایننووسن، (چونکە ئاسان نیەو مامەڵە دوادەخات، هەتا بۆتان دەکرێت) شایەت بگرن کاتێک کڕین و فرۆشتنتان ئەنجامدا و نابێت نوسەرو شایەت ئازار بدرێن و بێزار بکرێن، خۆ ئەگەر شتی وابکەن ئەوە بەراستی مانای وایە ئێوە لە چەندەها فەرمانبەرداری دەرچوون، جا لە خوا بترسن و خۆ پارێزن و خوا فێری ئەو شتانەتان دەکات (کە خێری تیایە بۆ دنیاو پاداشتی قیامەتی لە دوایە) و خوا بە هەموو شتێک زانایە.



وَإِن كُنتُمْ عَلَىٰ سَفَرٍ وَلَمْ تَجِدُوا كَاتِبًا فَرِهَٰنٌ مَّقْبُوضَةٌ فَإِنْ أَمِنَ بَعْضُكُم بَعْضًا فَلْيُؤَدِّ الَّذِي اؤْتُمِنَ أَمَٰنَتَهُۥ وَلْيَتَّقِ اللَّهَ رَبَّهُۥ وَلَا تَكْتُمُوا الشَّهَٰدَةَ وَمَن يَكْتُمْهَا فَإِنَّهُۥٓ ءَاثِمٌ قَلْبُهُۥ وَاللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ عَلِيمٌ ﴿٢٨٣﴾ لِّلَّهِ مَا فِي السَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي الْأَرْضِ وَإِن تُبْدُوا مَا فِيٓ أَنفُسِكُمْ أَوْ تُخْفُوهُ يُحَاسِبْكُم بِهِ اللَّهُ فَيَغْفِرُ لِمَن يَشَآءُ وَيُعَذِّبُ مَن يَشَآءُ وَاللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ ﴿٢٨٤﴾ ءَامَنَ الرَّسُولُ بِمَآ أُنزِلَ إِلَيْهِ مِن رَّبِّهِۦ وَالْمُؤْمِنُونَ كُلٌّ ءَامَنَ بِاللَّهِ وَمَلَٰٓئِكَتِهِۦ وَكُتُبِهِۦ وَرُسُلِهِۦ لَا نُفَرِّقُ بَيْنَ أَحَدٍ مِّن رُّسُلِهِۦ وَقَالُوا سَمِعْنَا وَأَطَعْنَا غُفْرَانَكَ رَبَّنَا وَإِلَيْكَ الْمَصِيرُ ﴿٢٨٥﴾ لَا يُكَلِّفُ اللَّهُ نَفْسًا إِلَّا وُسْعَهَا لَهَا مَا كَسَبَتْ وَعَلَيْهَا مَا اكْتَسَبَتْ رَبَّنَا لَا تُؤَاخِذْنَآ إِن نَّسِينَآ أَوْ أَخْطَأْنَا رَبَّنَا وَلَا تَحْمِلْ عَلَيْنَآ إِصْرًا كَمَا حَمَلْتَهُۥ عَلَى الَّذِينَ مِن قَبْلِنَا رَبَّنَا وَلَا تُحَمِّلْنَا مَا لَا طَاقَةَ لَنَا بِهِۦ وَاعْفُ عَنَّا وَاغْفِرْ لَنَا وَارْحَمْنَآ أَنتَ مَوْلَىٰنَا فَانصُرْنَا عَلَى الْقَوْمِ الْكَٰفِرِينَ ﴿٢٨٦﴾

(٢٨٣) خۆ ئەگەر لە سەفەردا بوون و نووسەرێکتان دەست نەکەوت، ئەوە بارمتەکان وەردەگیرێن (لەباتی قەباڵە و سەنەدەکە)، خۆ ئەگەر لە یەکتری دڵنیا بوون با ئەوەی بە ئەمین ودەستپاک دادەنرێت ئەمانەتەکەی (قەرزەکە) بداتەوە و با لەخوای پەروەردگاری بترسێت، نەکەن شایەتی بشارنەوە، ئەوەی شایەتی بشارێتەوە ئەوە بەراستی دڵی ژەنگاوی و ناپوخت گوناهبارە، خوایش بە هەموو ئەو کردەوانەی کە دەیکەن زانایە.

(٢٨٤) هەرچی لە ئاسمانەکان و هەرچی لە زەویدا هەیە هەر خوا خاوەنیانە و ئەگەر ئەوەی لە دڵ و دەروونتاندا جێگیر بووە، دەری بخەن، یان بیشارنەوە خوا دەربارەی لێتان دەپرسێتەوە، ئەوسا لە هەر کەس بیەوێت خۆش دەبێت و هەرکەس بیەوێت سزای دەدات و خوایش بەسەر هەموو شتێکدا دەسەڵاتی هەیە (ئەوەی چرپەی دەروونیە دێت و دەڕوات و جێگیر نابێت لێپرسینەوەی لەسەر نیە).

(٢٨٥) پێغەمبەرو ئیمانداران باوەڕیان هەیە بەوەی لە لایەن پەروەردگاریانەوە هاتۆتە خوارەوە، هەموویان باوەڕیان هەیە بە خواو فریشتەکانی و کتێبەکانی و پێغەمبەرەکانی (دەڵێن) هیچ جۆرە جیاوازیەک ناکەین لە نێوان هیچ پێغەمبەرێ لە پێغەمبەرەکانی خوادا (لە باوەڕدا)، هەروەها وتیان: گوێڕایەڵ و ملکەچین (بۆ بەدیهێنەرمان) پەروەردگارا لێخۆش بوونی تۆمان دەوێت و سەرئەنجام هەر بۆ لای تۆیە گەڕانەوە.

(٢٨٦) خوای گەورە ئەرکێ ناخاتە سەر هیچ کەسێک مەگەر بە قەدەر توانایی خۆیی نەبێت، هەر کارێکی چاک ئەنجام بدات قازانجی تەنها بۆ خۆیەتی و هەر خراپەیەکی کردبێت تەنها یەخەی خۆی دەگرێت و لەسەر خۆیەتی (هەر بۆیە ئیمانداران دەڵێن): پەروەردگارا! لێمان مەگرە ئەگەر فەرامۆشیمان بەسەردا هات یان گوناهو هەڵەیەکمان لە دەست قەوما، پەروەردگارا! ئەرکی سەخت و کاری گران مەدە بەسەرماندا وەکو ئەوەی داوتە بەسەر ئەوانەی پێش ئێمەدا، پەروەردگارا! ئەرکێک مەدە بەسەرماندا لە تواناماندا نەبێت، تووشی بەڵاو ناخۆشیەکمان مەکە تواناو هێزو هەناومان لێ ببڕێت، گوناهانمان بسڕەوە و چاوپۆشی بکە لە هەڵەو تاوانەکانمان و دای پۆشە، (داواکارین) بەزەییت بێتەوە پیاماندا، ڕەحممان پێ بکە، هەر تۆ پشت و پەناو یاریدەدەری ئێمەیت، جا بۆیە داوا دەکەین سەرمان بخەیت بەسەر قەومی کافرو خوانەناساندا، (ئا بەم شێوەیە پەروەردگاری مەزن فێری نزای ڕێک و پێکمان دەکات، ئومێدە کە لێشمان وەربگرێت..) کاتێک ئایەتی (٢٨٤) دابەزیووە هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ سەغڵەت بوون و چوون بۆ خزمەتی.. ئەویش فەرموویەتی: بڵێن گوێڕایەڵ و ملکەچین.. ئینجا خوای گەورە ئایەتی (٢٨٥، ٢٨٦)ی دابەزاند بۆ دڵدانەوەیان).



سورەتی (آل عمران)

بەناوی خوای بەخشندە و میهرەبان

(١) سەرنجی سەرەتای سورەتی (البقرة) بدە.

(٢) خوا زاتێکە جگە ئەو هیچ خوایەکی تر نییە شایەنی پەرستن بێت و ئەو هەمیشە زیندووە و راگرو سەرپەرشتیاری هەموو دروستکراوەکانیەتی.

(٣) ئەی پێغەمبەرﷺ خوا قورئانی بۆ تۆ بەراست و دروست (بە چەند قۆناغێک) دابەزاندووە، بەراست دانەری سەرجەم کتێبە پێشووەکانی پێش خۆیەتی (پێش دەستکاری کردنیان)، هەروەها تەوراتی بۆ (موسا) و ئینجیلی بۆ(عیسا) رەوانە کردووە لە پێش قورئاندا...

(٤) لەکاتێکدا هیدایەت و رێنموویی بەخشی خەڵکی بوون، هەروەها جیاکەرەوەی حەق و بەتاڵی ناردە خوارەوە (کە قورئانە)، بێگومان ئەوانەی بڕوایان نەهێنا بە ئایاتەکانی خوا، بۆ ئەوان سزایەکی سەخت (لە دوارۆژدا) هەیە، بێگومان خوای گەورە باڵادەستەو خاوەنی تۆڵەو سزایە (لە بێ باوەڕان).

(٥) بێگومان هیچ شتێک لە خوا وون نابێت نە لە زەوی و نە لە ئاسماندا.

(٦) ئەو خوایە زاتێکە نەخشەی رووخسارتان لە منداڵدانەکاندا دەکێشێت چۆن بیەوێت، هیچ پەرستراوێکی بەراست نییە جگە لەو خوایە و ئەو زاتە باڵادەست و دانا و کاربەجێیە.

(٧) ئەو خوایە زاتێکە کە قورئانی بۆ سەر تۆ (ئەی محمدﷺ) ناردە خوارەوە، بەشێک لە ئایەتەکانی دامەزراو و پایەدارو روون وئاشکران، ئەوانە بنچینەو بناغەی قورئانەکەن و هەندێکی تریشی واتای جۆراوجۆر هەڵدەگرن و بە ئاسانی نازانرێن، جا ئەوانەی کە لە دڵیاندا لاری ولادان هەیە، حەز لە حەق و راستی ناکەن، ئەوانە شوێنی ئەو ئایەتانە دەکەون کە ماناى جۆراو جۆر و فراوانیان هەیە، بۆ ئەوەی فیتنە و ئاشوب و ناکۆکی و دووبەرەکی دروست بکەن، یان بۆ ئەوەی لێکدانەوەی هەڵەی بۆ هەڵبەستن، لەحاڵێکدا کە لێکدانەوەی ئەو جۆرە ئایەتانە هەر خوا خۆی بە تەواوی دەیزانێت، جا ئەو کەسانەی کەلە زانستدا رۆچوون دەڵێن: ئێمە باوەڕی دامەزراومان بەهەر هەموو (ئەو ئایەتانە) هەیە کە لەلایەن پەروەردگارمانەوەیە و فەرمایشی ئەوە، (لەراستیدا) بێجگە لە خاوەن بیر و ژیرەکان یاداوەری وەرناگرن و بیرناکەنەوە (لەم قورئانە).

(٨) (ئەوانە دەڵێن) پەروەردگارا.. دوای ئەوەی‌کە هیدایەت و رێنموویيت کردین، دڵەکانمان لامەدە لە رێگەی راست و لە رەحمەت و بەخششی تایبەتی خۆت بەهرەوەرمان بکە، چونکە بەڕاستی تۆ بەخشندە و بەخشێنەری.

(٩) پەروەردگارا بەڕاستی تۆ کۆکەرەوەی هەموو خەڵکیت لە رۆژێکدا کە هیچ گومانی تێدانیە، بێگومان خوا (زاتێک نیە) کە بەڵێنی خۆی نەباتە سەر....

إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ لَن تُغْنِىَ عَنْهُمْ أَمْوَٰلُهُمْ وَلَآ أَوْلَٰدُهُم مِّنَ ٱللَّهِ شَيْـًٔا ۖ وَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمْ وَقُودُ ٱلنَّارِ ﴿١٠﴾ كَدَأْبِ ءَالِ فِرْعَوْنَ وَٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ ۚ كَذَّبُوا۟ بِـَٔايَٰتِنَا فَأَخَذَهُمُ ٱللَّهُ بِذُنُوبِهِمْ ۗ وَٱللَّهُ شَدِيدُ ٱلْعِقَابِ ﴿١١﴾ قُل لِّلَّذِينَ كَفَرُوا۟ سَتُغْلَبُونَ وَتُحْشَرُونَ إِلَىٰ جَهَنَّمَ ۚ وَبِئْسَ ٱلْمِهَادُ ﴿١٢﴾ قَدْ كَانَ لَكُمْ ءَايَةٌ فِى فِئَتَيْنِ ٱلْتَقَتَا ۖ فِئَةٌ تُقَٰتِلُ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ وَأُخْرَىٰ كَافِرَةٌ يَرَوْنَهُم مِّثْلَيْهِمْ رَأْىَ ٱلْعَيْنِ ۚ وَٱللَّهُ يُؤَيِّدُ بِنَصْرِهِۦ مَن يَشَآءُ ۗ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَعِبْرَةً لِّأُو۟لِى ٱلْأَبْصَٰرِ ﴿١٣﴾ زُيِّنَ لِلنَّاسِ حُبُّ ٱلشَّهَوَٰتِ مِنَ ٱلنِّسَآءِ وَٱلْبَنِينَ وَٱلْقَنَٰطِيرِ ٱلْمُقَنطَرَةِ مِنَ ٱلذَّهَبِ وَٱلْفِضَّةِ وَٱلْخَيْلِ ٱلْمُسَوَّمَةِ وَٱلْأَنْعَٰمِ وَٱلْحَرْثِ ۗ ذَٰلِكَ مَتَٰعُ ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا ۖ وَٱللَّهُ عِندَهُۥ حُسْنُ ٱلْمَـَٔابِ ﴿١٤﴾ ۞ قُلْ أَؤُنَبِّئُكُم بِخَيْرٍ مِّن ذَٰلِكُمْ ۚ لِلَّذِينَ ٱتَّقَوْا۟ عِندَ رَبِّهِمْ جَنَّٰتٌ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَا وَأَزْوَٰجٌ مُّطَهَّرَةٌ وَرِضْوَٰنٌ مِّنَ ٱللَّهِ ۗ وَٱللَّهُ بَصِيرٌۢ بِٱلْعِبَادِ ﴿١٥﴾



(١٠) (لەو ڕۆژەدا) بەڕاستی ئەوانەی کە بێ باوەڕن هەرگیز ماڵ و منداڵیان هیچ جۆرە بەرگریەکیان لێ ناکەن لە سزای خوا، ئا ئەوانە سووتەمەنی ئاگری دۆزەخن.

(١١) ئەوانە داب و نەریتیان وەکو داب و نەریتی داروودەستەی فیرعەون و ئەوانەی کە پێشیان هاتوون وایە، ئایەت و موعجیزەکانی ئێمەیان بەدرۆ دانا، خوایش ئەوانی بەهۆی گوناهو تاوانیانەوە بەتوندی سزادا و گرفتاری کردن و خوا تۆڵەسێنەرێکی بەهێز و بەزەبرە.

(١٢) (ئەی محمد ﷺ) بڵێ بەوانەی کە بڕوایان نەهێناوە: سەرئەنجام تێکدەشکێن و ژێردەست دەخرێن (لە دنیادا، لە ڕۆژی دوایشدا) کۆ دەکرێنەوە و ڕاپێچ دەکرێن بۆ ناو دۆزەخ کە ناخۆشترین جێگەیە.

(١٣) (ئەی محمد ﷺ بەو خەڵکە بڵێ) بێگومان لەو دوو دەستەیەی کە لە (جەنگی بەدردا) ڕوو بە ڕووی یەکتر وەستان نیشانەو پەندێکی گەورە بوو بۆتان، دەستەیەکیان لە پێناوی خوادا دەجەنگان، دەستەکەی تریان بێباوەڕ بوون، ئیمانداران لەبەر چاوی ئەواندا دوو ئەوەندەیان دەنواند(لە مەیدانی جەنگدا بەچاوی بینایی و بینین)، (خوا فریشتەیشی دابەزاند بۆ یارمەتی ئیمانداران)، خوا پشتگیری (هەر دەستەیەک)و هەرکەسێک بیەوێت دەیکات، بەڕاستی ئا لەو یارمەتیەدا پەند و ئامۆژگاری هەیە بۆ ئەوانەی کە بینایی خۆیان بەکاردەهێنن و بەوردیی بیردەکەنەوە (کە چۆن کۆمەڵێکی کەم زاڵ بوون بەسەر کۆمەڵێکی زۆردا).

(١٤) ئارەزووی ئافرەت و بوونی نەوەی نێرینە و خاوەنێتی ئاڵتون و زێرو زیووی زۆرو زەبەندە و ئەسپی چاک و ڕەسەن و(هۆکانی هاتووچۆ) هەروەها ماڵات و زەوی و زاری کشتوکاڵ بۆ خەڵکی ڕازێنراوەتەوە، ئەوانە هەمووی ئازو نیعمەتی ژیانی دنیان، خوایش(بۆ چاکان) شوێنی گەڕانەوەی ڕازاوەو خۆشی لای خۆی ئامادە کردووە(کە بەهەشتە).

(١٥) (ئەی محمد ﷺ بەو خەڵکە) بڵێ: ئایا هەواڵی چاکتر لەو ئازو نیعمەتانەتان پێ ڕابگەیەنم؟!

(ئەویش ئەمەیە کە): بۆ ئەوانەی پارێزکارو خواناسن، لای پەروەردگاریان باخەکانی بەهەشت ئامادەیە بۆیان کە: چەندەها ڕووبار بەژێر درەختەکانیداو بەبەردەم کۆشکەکانیدا دەڕوات، هاوڕێ لەگەڵ ژیانی نەبڕاوە لەگەڵ هاوسەرانی پاکیزەدا و بەدەم هەست کردنی بەردەوام بەڕەزامەندیی پەروەردگاری ئازیز، بێگومان ئەو خوایە بینایە بەبەندەکانی.

ٱلَّذِينَ يَقُولُونَ رَبَّنَآ إِنَّنَآ ءَامَنَّا فَٱغۡفِرۡ لَنَا ذُنُوبَنَا وَقِنَا عَذَابَ ٱلنَّارِ ﴿١٦﴾ ٱلصَّـٰبِرِينَ وَٱلصَّـٰدِقِينَ وَٱلۡقَـٰنِتِينَ وَٱلۡمُنفِقِينَ وَٱلۡمُسۡتَغۡفِرِينَ بِٱلۡأَسۡحَارِ ﴿١٧﴾ شَهِدَ ٱللَّهُ أَنَّهُۥ لَآ إِلَـٰهَ إِلَّا هُوَ وَٱلۡمَلَـٰٓئِكَةُ وَأُوْلُواْ ٱلۡعِلۡمِ قَآئِمَۢا بِٱلۡقِسۡطِۚ لَآ إِلَـٰهَ إِلَّا هُوَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡحَكِيمُ ﴿١٨﴾ إِنَّ ٱلدِّينَ عِندَ ٱللَّهِ ٱلۡإِسۡلَـٰمُۗ وَمَا ٱخۡتَلَفَ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡكِتَـٰبَ إِلَّا مِنۢ بَعۡدِ مَا جَآءَهُمُ ٱلۡعِلۡمُ بَغۡيَۢا بَيۡنَهُمۡۗ وَمَن يَكۡفُرۡ بِـَٔايَـٰتِ ٱللَّهِ فَإِنَّ ٱللَّهَ سَرِيعُ ٱلۡحِسَابِ ﴿١٩﴾ فَإِنۡ حَآجُّوكَ فَقُلۡ أَسۡلَمۡتُ وَجۡهِيَ لِلَّهِ وَمَنِ ٱتَّبَعَنِۗ وَقُل لِّلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡكِتَـٰبَ وَٱلۡأُمِّيِّـۧنَ ءَأَسۡلَمۡتُمۡۚ فَإِنۡ أَسۡلَمُواْ فَقَدِ ٱهۡتَدَواْۖ وَّإِن تَوَلَّوۡاْ فَإِنَّمَا عَلَيۡكَ ٱلۡبَلَـٰغُۗ وَٱللَّهُ بَصِيرُۢ بِٱلۡعِبَادِ ﴿٢٠﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَكۡفُرُونَ بِـَٔايَـٰتِ ٱللَّهِ وَيَقۡتُلُونَ ٱلنَّبِيِّـۧنَ بِغَيۡرِ حَقّٖ وَيَقۡتُلُونَ ٱلَّذِينَ يَأۡمُرُونَ بِٱلۡقِسۡطِ مِنَ ٱلنَّاسِ فَبَشِّرۡهُم بِعَذَابٍ أَلِيمٍ ﴿٢١﴾ أُوْلَـٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ حَبِطَتۡ أَعۡمَـٰلُهُمۡ فِي ٱلدُّنۡيَا وَٱلۡأٓخِرَةِ وَمَا لَهُم مِّن نَّـٰصِرِينَ ﴿٢٢﴾

(١٦) ئەوانەی کە دەڵێن: پەروەردگارا، بەڕاستی ئێمە ئیمان و باوەڕمان هێناوە، دە لە گوناهەکانمان خۆش ببە و لە ئاگری دۆزەخ بمانپارێزە.

(١٧) (جا ئەو ئیماندارانە، ئەمە سیفەتیانە) خۆگرو ئارامگرن (لە بەرامبەر ناسۆر و ناخۆشیەکانی ژیانەوە)، ڕاستگۆو خواپەرستن، ماڵ و سامان دەبەخشن و، لە بەرەبەیانەکاندا داوای لێخۆشبوون (لە پەروەردگاریان دەکەن چونکە واهەست دەکەن کە وەک پێویست خواپەرستیان نەکردووە).

(١٨) خوای گەورە (لە ڕێگەی دروست کراوانیەوە، کە هەمووی نیشانەی دەسەڵاتی دەنوێنێت) خۆی شایەتی داوە و دەریخستووە و سەلماندویەتی کە بەراستی جگە لەو هیچ خوایەکی تر نییە کە شایانی پەرستن بێت، هەروەها فریشتەکان و خاوەن زانستەکانیش (لە پێغەمبەران و زانایان) کە بەڕێگەیەکی ڕاست و دروست دەیسەلمێنن خوا هەمیشە داد پەروەری ڕەهایە و جگە لەوزاتە خوایەکی تر نیە و ئەو خوایەکی بالادەست و دانایە.

(١٩) بەڕاستی دین و ئاینی پەسەند لای خوا تەنها ئاینی ئیسلامە، ئەوانەش کە کتێبە (ئاسمانیەکانیان) دراوەتێ، جیاوازیان لە نێواندا پەیدا نەبووە مەگەر لە دوای ئەوەی زانستی و زانیاری تەواویان بۆ هاتووە (دەربارەی ڕاستی محمد و ئیسلام)، ئەمەش بەهۆی دنیاپەرستی و حەسوودیی و ستەم کردنیان لە نێو خۆیان (چونکە ڕازی نەبوون بە پێغەمبەرێک لە غەیری خۆیان)، جا ئەوەی باوەڕی بە فەرمان و ئایەتەکانی خوا نەبێت، ئەوە بێگومان خوا بەخێرایی حسابی خۆی دەکات لەگەڵیاندا (هەر زوو بەدۆزەخیان دەگەیەنێت).

(٢٠) خۆ ئەگەر موجادەلە و گفتوگۆی سەختیان لەگەڵدا کردیت، ئەی محمد ﷺ تۆش بڵێ: من و ئەوانەی کە شوێنم کەوتوون ڕوومان کردۆتە خواو تەنها ملکەچی ئەوین، بەوانەی کە کتێبیان پێدراوە و ئەوانەش نەخوێندەوارن لە (موشریکانی عەرەب) بڵێ: ئایا ئێوە تەسلیم بوون بەخواو موسوڵمان بوون؟ خۆ ئەگەر تەسلیم بوون، ئەوە مانای وایە بەراستی ئەوە هیدایەتیان وەرگرتووە، خۆ ئەگەر پشت هەڵکەن و باوەڕنەهێنن، ئەوە تەنها گەیاندنی پەیامەکە لەسەرتۆیە، خوای گەورەش بینایە بەبەندەکانی.

(٢١) بەڕاستی ئەوانەی باوەڕ ناهێنن بەئایەت و فەرمانەکانی خوا و پێغەمبەرانیش بەبێ هیچ حەقێک دەکوژن و ئەو خەڵکانەش دەکوژن کە فەرمان بە دادپەروەری دەدەن، کەواتە مژدەی سزایەکی پڕ ئێشیان پێ بدە!!

(٢٢) ئا ئەوانە کەسانێکن کردەوەکانیان پووچ بۆتەوە لە دنیاو قیامەتدا، کەسیش نیە پشتیوانی لەوان بکات.

أَلَمْ تَرَ إِلَى الَّذِينَ أُوتُوا نَصِيبًا مِّنَ الْكِتَابِ يُدْعَوْنَ إِلَىٰ كِتَابِ اللَّهِ لِيَحْكُمَ بَيْنَهُمْ ثُمَّ يَتَوَلَّىٰ فَرِيقٌ مِّنْهُمْ وَهُم مُّعْرِضُونَ ﴿٢٣﴾ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ قَالُوا لَن تَمَسَّنَا النَّارُ إِلَّا أَيَّامًا مَّعْدُودَاتٍ ۖ وَغَرَّهُمْ فِي دِينِهِم مَّا كَانُوا يَفْتَرُونَ ﴿٢٤﴾ فَكَيْفَ إِذَا جَمَعْنَاهُمْ لِيَوْمٍ لَّا رَيْبَ فِيهِ وَوُفِّيَتْ كُلُّ نَفْسٍ مَّا كَسَبَتْ وَهُمْ لَا يُظْلَمُونَ ﴿٢٥﴾ قُلِ اللَّهُمَّ مَالِكَ الْمُلْكِ تُؤْتِي الْمُلْكَ مَن تَشَاءُ وَتَنزِعُ الْمُلْكَ مِمَّن تَشَاءُ وَتُعِزُّ مَن تَشَاءُ وَتُذِلُّ مَن تَشَاءُ ۖ بِيَدِكَ الْخَيْرُ ۖ إِنَّكَ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ ﴿٢٦﴾ تُولِجُ اللَّيْلَ فِي النَّهَارِ وَتُولِجُ النَّهَارَ فِي اللَّيْلِ ۖ وَتُخْرِجُ الْحَيَّ مِنَ الْمَيِّتِ وَتُخْرِجُ الْمَيِّتَ مِنَ الْحَيِّ ۖ وَتَرْزُقُ مَن تَشَاءُ بِغَيْرِ حِسَابٍ ﴿٢٧﴾ لَّا يَتَّخِذِ الْمُؤْمِنُونَ الْكَافِرِينَ أَوْلِيَاءَ مِن دُونِ الْمُؤْمِنِينَ ۖ وَمَن يَفْعَلْ ذَٰلِكَ فَلَيْسَ مِنَ اللَّهِ فِي شَيْءٍ إِلَّا أَن تَتَّقُوا مِنْهُمْ تُقَاةً ۗ وَيُحَذِّرُكُمُ اللَّهُ نَفْسَهُ ۗ وَإِلَى اللَّهِ الْمَصِيرُ ﴿٢٨﴾ قُلْ إِن تُخْفُوا مَا فِي صُدُورِكُمْ أَوْ تُبْدُوهُ يَعْلَمْهُ اللَّهُ ۗ وَيَعْلَمُ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الْأَرْضِ ۗ وَاللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ ﴿٢٩﴾

(٢٣) ئایا نابینی ئەو کەسانەی بەشێک لە کتێبی ئاسمانیان پێدراوە کاتێک بانگ دەکرێن بۆ لای کتێبی خوا (تەورات) تا فەرمانڕەوایی بکات لە نێوانیاندا، پاشان دەستەیەکیان پشت هەڵدەکەن و لە کاتێکدا ئەوان سەرپێچیکەرن.

(٢٤) بۆیەش (وادەکەن) چونکە بەراستی ئەوان دەیانووت: هەرگیز ئاگری دۆزەخ چەند ڕۆژێکی کەم نەبێت بەر لەشمان ناکەوێت و ئەوەی لە ئاینەکەیاندا بۆ خۆیان هەڵبەستبوو، سەری لێ شێواندن و تەفرەی دان.

(٢٥) ئاخۆ حاڵیان چۆن بێت کاتێ لەو ڕۆژەدا کۆیان دەکەینەوە کە هیچ گومانێک لە هاتنیدا نیە و هەموو کەس پاداشتی کارو کردەوەی خۆی پێدەدرێت، لەکاتێکدا ئەوان ستەمیان لێناکرێت

(٢٦) (ئەی پێغەمبەر ﷺ، ئەی ئیماندار) بڵێ: خوایە تۆ خاوەنی هەموو شتێکیت، دەسەڵات دەبەخشیت بەهەرکەسێک بتەوێت ودەسەڵات وەردەگریتەوە لە هەر کەسێک بتەوێت هەر کەس بتەوێت باڵادەستی دەکەیت، هەرکەسێکیش بتەوێت زەلیل و بێ دەسەڵات و ژێردەستی دەکەیت، هەرچی خێر هەیە هەر بە دەست تۆیە، بێگومان تۆ دەسەڵاتداری بەسەر هەموو شتێکدا.

(٢٧) شەو تێهەڵکێشی ڕۆژ دەکەیت، ڕۆژ تێهەڵکێشی شەو دەکەیت، زیندوو لە مردوو دەردێنیت، مردوو لە زیندوو دەردێنیت، ڕزق و ڕۆزیی بێ حساب و بێ شومار دەبەخشیت بە هەرکەس بتەوێت (کارەکانت هەر هەمووی پڕە لە حیکمەت و دانایی، بەندەکانت سەرسام و سەر سووڕماوون لە کەماڵی تۆ).

(٢٨) نابێت ئیمانداران، کافران بکەنە پشت و پەناو یارو یاوەری خۆیان لەجیاتی ئیمانداران، ئەوەی کاری وا بکات، ئەوکارەی دەبێتە هۆی ئەوەی هیچ پەیوەندییەکی ئیمانیی بەخواوە نەمێنێت، مەگەر لەبەر ئەوەی خۆتان بە بێگومان لە شەڕیان بپارێزن و قوتاربن (ئەویش بەوەی بەدەم ڕازییان بکەن، نەک بەدڵ وکردەوە)، خوای گەورەش بێدارتان دەکاتەوە بەسیفەتی تۆڵەسەندنەوەی خۆی دەتانترسێنێت (تا کاری ناڕەوای وانەکەن)، سەرەنجام وگەڕانەوەتان هەر بۆلای خوایە.

(٢٩) پێیان بڵێ: ئەگەر ئەوەی لە سینەتاندا جێگیرە بیشارنەوە یاخود ئاشکرای بکەن، ئەوە خوا پێی دەزانێت، هەرچیش لە ئاسمانەکان و زەویدا هەیە هەر پێی دەزانێت و خوا دەسەڵاتی بەسەر هەموو شتێکدا هەیە.

يَوۡمَ تَجِدُ كُلُّ نَفۡسٖ مَّا عَمِلَتۡ مِنۡ خَيۡرٖ مُّحۡضَرٗا وَمَا عَمِلَتۡ مِن سُوٓءٖ تَوَدُّ لَوۡ أَنَّ بَيۡنَهَا وَبَيۡنَهُۥٓ أَمَدَۢا بَعِيدٗاۗ وَيُحَذِّرُكُمُ ٱللَّهُ نَفۡسَهُۥۗ وَٱللَّهُ رَءُوفُۢ بِٱلۡعِبَادِ ﴿٣٠﴾ قُلۡ إِن كُنتُمۡ تُحِبُّونَ ٱللَّهَ فَٱتَّبِعُونِي يُحۡبِبۡكُمُ ٱللَّهُ وَيَغۡفِرۡ لَكُمۡ ذُنُوبَكُمۡۚ وَٱللَّهُ غَفُورٞ رَّحِيمٞ ﴿٣١﴾ قُلۡ أَطِيعُواْ ٱللَّهَ وَٱلرَّسُولَۖ فَإِن تَوَلَّوۡاْ فَإِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ ٱلۡكَٰفِرِينَ ﴿٣٢﴾ ۞ إِنَّ ٱللَّهَ ٱصۡطَفَىٰٓ ءَادَمَ وَنُوحٗا وَءَالَ إِبۡرَٰهِيمَ وَءَالَ عِمۡرَٰنَ عَلَى ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴿٣٣﴾ ذُرِّيَّةَۢ بَعۡضُهَا مِنۢ بَعۡضٖۗ وَٱللَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ ﴿٣٤﴾ إِذۡ قَالَتِ ٱمۡرَأَتُ عِمۡرَٰنَ رَبِّ إِنِّي نَذَرۡتُ لَكَ مَا فِي بَطۡنِي مُحَرَّرٗا فَتَقَبَّلۡ مِنِّيٓۖ إِنَّكَ أَنتَ ٱلسَّمِيعُ ٱلۡعَلِيمُ ﴿٣٥﴾ فَلَمَّا وَضَعَتۡهَا قَالَتۡ رَبِّ إِنِّي وَضَعۡتُهَآ أُنثَىٰ وَٱللَّهُ أَعۡلَمُ بِمَا وَضَعَتۡ وَلَيۡسَ ٱلذَّكَرُ كَٱلۡأُنثَىٰۖ وَإِنِّي سَمَّيۡتُهَا مَرۡيَمَ وَإِنِّيٓ أُعِيذُهَا بِكَ وَذُرِّيَّتَهَا مِنَ ٱلشَّيۡطَٰنِ ٱلرَّجِيمِ ﴿٣٦﴾ فَتَقَبَّلَهَا رَبُّهَا بِقَبُولٍ حَسَنٖ وَأَنۢبَتَهَا نَبَاتًا حَسَنٗا وَكَفَّلَهَا زَكَرِيَّاۖ كُلَّمَا دَخَلَ عَلَيۡهَا زَكَرِيَّا ٱلۡمِحۡرَابَ وَجَدَ عِندَهَا رِزۡقٗاۖ قَالَ يَٰمَرۡيَمُ أَنَّىٰ لَكِ هَٰذَاۖ قَالَتۡ هُوَ مِنۡ عِندِ ٱللَّهِۖ إِنَّ ٱللَّهَ يَرۡزُقُ مَن يَشَآءُ بِغَيۡرِ حِسَابٍ ﴿٣٧﴾



(٣٠) ڕۆژێک دێت هەمووکەس، کاروکردەوەکانی خۆی دەبینێت ئامادە کراون بەخێرو شەڕیەوە، تاوانبار ئاوات دەخوازێت کە لە نێوان خۆی و کردەوە خراپەکانیدا مەودایەکی دوورو درێژ هەبوایە، خوای گەورەش بێدارتان دەکاتەوە بە سیفەتی تۆڵەسەندنەوەی خۆی دەتانترسێنێت(لەوەی کە کاری نارەوا بکەن) و خوا بەسۆز و بە بەزەییە بۆ ئەو بەندانەی (کە بەم ئاگاداریانە دڵیان رادەچڵەکێت پێش هاتنی ئەو رۆژە).

(٣١) (ئەی پێغەمبەر ﷺ بە ئیمانداران) بڵێ: ئەگەر ئێوە خواتان خۆش دەوێت دە شوێنی من بکەون و لە فەرمانی من دەرمەچن، ئەوکاتە خوایش ئێوەی خۆش دەوێت و لە گوناهو هەڵەکانیشتان خۆش دەبێت، ئەو خوایە لێخۆشبوو و میهرەبانە.

(٣٢) (دووبارە) پێیان بڵێ: فەرمانبەرداری خواو پێغەمبەر بن، خۆ ئەگەر سەرپێچی بکەن و پشتی تێبکەن ئەوە دڵنیابن خوا بێ باوەڕانی خۆش ناوێت.

(٣٣) بەڕاستی خوا ئادەم و نوح و نەوەکانی ئیبراهیم و نەوەکانی عیمرانی هەڵبژاردووەو ڕێزی داوون بەسەر خەڵکی هەموو جیهاندا.

(٣٤) ئەوانە نەوەیەکن یەکڕەچەڵکن، هەندێکیان لە هەندێکی تریان بوون، خوا خۆی بیسەرو زانایە (چاک دەیزانی کە شایستەن بۆ ئەو کارە پیرۆزە).

(٣٥) (بەیاد بێنە)کاتێک هاوسەری عیمران وتی: پەروەردگارا؛ بەراستی من بڕیارم داوەو نەزرم کردووە ئەو منداڵەی لە سکمدایە ئازاد کراوبێت لە هەموو ئەرک و ئیش و کارێک (تا هەر لە خزمەتی بیت المقدس دا بێت) دە تۆش لێم وەریگرە، چونکە بەراستی تۆ خوایەکی بیسەرو زانایت.

(٣٦) بەڵام کاتێک منداڵەکەی بوو(بە دڵشکاویەوە) وتی: پەروەردگارا خۆمن کچم بوو، بێگومان خوا خۆی چاک دەزانێت کە چی بووە، (خۆ ئاشکرایە) کوڕیش وەکو کچ نییە (لەگەڵی ڕووەوە و هەریەکە ئەرک و فرمانی خۆی هەیە، ئەوەی بە ئافرەت دەکرێت بەپیاو ناکرێت، بەپێچەوانەشەوە، ژن و پیاو تەواوکاری یەکترن و هیچیان لای خوا کەم ڕێزنین ئەرکی خزمەتکاری بیت المقلسیش بەو ناکرێت)، منیش بەراستی ناوم نا مەریەم و من ئەیپارێزم بەتۆ خۆی و وەچەکەی لە شەیتانی رەجم کراو.

(٣٧) ئینجا پەروەردگاری بەشێوەیەکی جوان و پەسەند مەریەمی وەرگرت، زۆر بەجوانی پێی گەیاند، زەکەریای کردە مامۆستاو سەرپەرشتی (کە هەم خزم و هەم پێغەمبەر بوو، تا بەچاکی دینداریی فێر بکات، پاشان کە مەریەم گەورە بوو) هەرکاتێک زەکەریا دەچوو بۆ سەردانی لە شوێنی خواپەرستیەکەیدا دەیبینی رزق و ڕۆزیی و نازو نیعمەتی جۆراوجۆری لایە، زەکەریا: وتی ئەی مەریەم ئەم هەموو رزق و ڕۆزییەت لەکوێ بوو؟!، مەریەم لە وەڵامیدا وتی: ئەوە لە لایەن خواوەیە، ئەو بۆم دەنێرێت، بەراستی خوا بە هەر کەس بیەوێت رزق و ڕۆزیی بێ سنوورو بێ هۆکار دەبەخشێت.

هُنَالِكَ دَعَا زَكَرِيَّا رَبَّهُۥ قَالَ رَبِّ هَبْ لِى مِن لَّدُنكَ ذُرِّيَّةً طَيِّبَةً إِنَّكَ سَمِيعُ ٱلدُّعَآءِ ﴿٣٨﴾ فَنَادَتْهُ ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ وَهُوَ قَآئِمٌ يُصَلِّى فِى ٱلْمِحْرَابِ أَنَّ ٱللَّهَ يُبَشِّرُكَ بِيَحْيَىٰ مُصَدِّقًۢا بِكَلِمَةٍ مِّنَ ٱللَّهِ وَسَيِّدًا وَحَصُورًا وَنَبِيًّا مِّنَ ٱلصَّٰلِحِينَ ﴿٣٩﴾ قَالَ رَبِّ أَنَّىٰ يَكُونُ لِى غُلَٰمٌ وَقَدْ بَلَغَنِىَ ٱلْكِبَرُ وَٱمْرَأَتِى عَاقِرٌ قَالَ كَذَٰلِكَ ٱللَّهُ يَفْعَلُ مَا يَشَآءُ ﴿٤٠﴾ قَالَ رَبِّ ٱجْعَل لِّىٓ ءَايَةً قَالَ ءَايَتُكَ أَلَّا تُكَلِّمَ ٱلنَّاسَ ثَلَٰثَةَ أَيَّامٍ إِلَّا رَمْزًا وَٱذْكُر رَّبَّكَ كَثِيرًا وَسَبِّحْ بِٱلْعَشِىِّ وَٱلْإِبْكَٰرِ ﴿٤١﴾ وَإِذْ قَالَتِ ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ يَٰمَرْيَمُ إِنَّ ٱللَّهَ ٱصْطَفَىٰكِ وَطَهَّرَكِ وَٱصْطَفَىٰكِ عَلَىٰ نِسَآءِ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٤٢﴾ يَٰمَرْيَمُ ٱقْنُتِى لِرَبِّكِ وَٱسْجُدِى وَٱرْكَعِى مَعَ ٱلرَّٰكِعِينَ ﴿٤٣﴾ ذَٰلِكَ مِنْ أَنۢبَآءِ ٱلْغَيْبِ نُوحِيهِ إِلَيْكَ وَمَا كُنتَ لَدَيْهِمْ إِذْ يُلْقُونَ أَقْلَٰمَهُمْ أَيُّهُمْ يَكْفُلُ مَرْيَمَ وَمَا كُنتَ لَدَيْهِمْ إِذْ يَخْتَصِمُونَ ﴿٤٤﴾ إِذْ قَالَتِ ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ يَٰمَرْيَمُ إِنَّ ٱللَّهَ يُبَشِّرُكِ بِكَلِمَةٍ مِّنْهُ ٱسْمُهُ ٱلْمَسِيحُ عِيسَى ٱبْنُ مَرْيَمَ وَجِيهًا فِى ٱلدُّنْيَا وَٱلْآخِرَةِ وَمِنَ ٱلْمُقَرَّبِينَ ﴿٤٥﴾

(٣٨) ئا لەو کات و شوێنەدا، زەکەریا هانا و نزای بۆ پەروەردگاری لێ بەرز بۆوە و وتی: پەروەردگارا نەوەی چاک و پاکم پێ ببەخشە، بەراستی تۆ بیسەری دوعا و نزایت.

(٣٩) جا یەکسەر فریشتە جبرئیل بانگی کرد لەکاتێکدا زەکەریا لە محرابەکەدا وەستا بوو، نوێژی دەکرد، (وتی) بەراستی خوای گەورە مژدەت دەداتێ بە بەخشینی کوڕێک ناوی یەحیایە، بەراستدانەری فەرمانی تایبەتی خوایە و گەورە و ڕێزدارە و خۆپارێزە لە گوناهان و پێغەمبەرێکە لە چاکان.

(٤٠) زەکەریا وتی: پەروەردگارا! ئاخۆ چۆن منداڵم پێ دەبەخشیت خۆ من پیری تەنگی پێ هەڵچنیووم، هاوسەرەکەشم سکی ناکات، خوای گەورەش فەرمووی: کاری خوا هەر ئاوایە و هەر چیەکی بوێت، دەیکات.

(٤١) ئینجا زەکەریا وتی: پەروەردگارا نیشانەیەکم بۆ دیاری بکە تا دڵنیابم کە خێزانم سکی بووە، خوای گەورە فەرمووی: نیشانەکەت ئەوەیە کە توانای قسە کردنت تا سێ ڕۆژ لەگەڵ خەڵکیدا نابێت (زمانت دەبەسرێت) مەگەر بە ئیشارەت و ئاماژە نەبێت، تۆش زۆر یادی پەروەردگارت و تەسبیحات و ستایشی بکە بەتایبەتی لە دەمە و ئێوارە و بەرەبەیاندا.

(٤٢) (هەروەها یادیان بهێنە کاتێک) جبرئیلی فریشتە وتی: ئەی مەریەم بەراستی خوا تۆی هەڵبژاردوە و خاوێن و پاکیزەی کردویت، هەڵی بژاردویت و ڕێزی داویت بەسەر هەموو ئافرەتانی جیهاندا.

(٤٣) ئەی مەریەم ملکەچ و فەرمانبەرداری پەروەردگارت بە، سوژدە و کڕنووشی بۆ ببە لەگەڵ کڕنووشبەراندا.

(٤٤) ئەوشتانەی باسکران چەند هەواڵێک بوون لە غەیبەوە، ئێمە لەڕێگەی (وەحی) و سروشەوە بەتۆی دەگەیەنین، خۆ تۆ (ئەی محمد ﷺ) لەوێ نەبوویت کاتێک پێنوسەکانیان هەڵئەدایە (ئاوەوە، پێنوسی کێ سەرکەوت و ئاو نەیبرد) ئەوەیان مەریەم پەروەردە بکات، تۆ لەوێش نەبوویت کاتێک کێشەیان هەبوو (لەسەر ئەوەی کێ بەخێوی بکات).

(٤٥) (هەروەها یادیان بهێنە) کاتێک فریشتەکە بە مەریەمی وت: ئەی مەریەم بەراستی خوا مژدەت دەداتێ: بە وشەیەکی خۆی (کە فرمانی ـ کن فیکون ـ ە، ڕۆڵەیەکت پێ ببەخشێت) کە ناوی (المسیح)ە، عیسای کوڕی مەریەمە، کە پیاو ماقووڵ و پایە بەرزە لەم دنیادا، لە قیامەتیشدا لە دەستەی نزیکانە (لە ئێمەوە).

وَيُكَلِّمُ ٱلنَّاسَ فِي ٱلْمَهْدِ وَكَهْلًا وَمِنَ ٱلصَّٰلِحِينَ ﴿٤٦﴾ قَالَتْ رَبِّ أَنَّىٰ يَكُونُ لِي وَلَدٌ وَلَمْ يَمْسَسْنِي بَشَرٌ قَالَ كَذَٰلِكِ ٱللَّهُ يَخْلُقُ مَا يَشَآءُ إِذَا قَضَىٰٓ أَمْرًا فَإِنَّمَا يَقُولُ لَهُۥ كُن فَيَكُونُ ﴿٤٧﴾ وَيُعَلِّمُهُ ٱلْكِتَٰبَ وَٱلْحِكْمَةَ وَٱلتَّوْرَىٰةَ وَٱلْإِنجِيلَ ﴿٤٨﴾ وَرَسُولًا إِلَىٰ بَنِيٓ إِسْرَٰٓءِيلَ أَنِّي قَدْ جِئْتُكُم بِـَٔايَةٍ مِّن رَّبِّكُمْ أَنِّيٓ أَخْلُقُ لَكُم مِّنَ ٱلطِّينِ كَهَيْـَٔةِ ٱلطَّيْرِ فَأَنفُخُ فِيهِ فَيَكُونُ طَيْرًۢا بِإِذْنِ ٱللَّهِ وَأُبْرِئُ ٱلْأَكْمَهَ وَٱلْأَبْرَصَ وَأُحْيِ ٱلْمَوْتَىٰ بِإِذْنِ ٱللَّهِ وَأُنَبِّئُكُم بِمَا تَأْكُلُونَ وَمَا تَدَّخِرُونَ فِي بُيُوتِكُمْ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَءَايَةً لَّكُمْ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ ﴿٤٩﴾ وَمُصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ يَدَيَّ مِنَ ٱلتَّوْرَىٰةِ وَلِأُحِلَّ لَكُم بَعْضَ ٱلَّذِي حُرِّمَ عَلَيْكُمْ وَجِئْتُكُم بِـَٔايَةٍ مِّن رَّبِّكُمْ فَٱتَّقُوا ٱللَّهَ وَأَطِيعُونِ ﴿٥٠﴾ إِنَّ ٱللَّهَ رَبِّي وَرَبُّكُمْ فَٱعْبُدُوهُ هَٰذَا صِرَٰطٌ مُّسْتَقِيمٌ ﴿٥١﴾ ۞ فَلَمَّآ أَحَسَّ عِيسَىٰ مِنْهُمُ ٱلْكُفْرَ قَالَ مَنْ أَنصَارِيٓ إِلَى ٱللَّهِ قَالَ ٱلْحَوَارِيُّونَ نَحْنُ أَنصَارُ ٱللَّهِ ءَامَنَّا بِٱللَّهِ وَٱشْهَدْ بِأَنَّا مُسْلِمُونَ ﴿٥٢﴾



(٤٦) جا عیسا لە بێشکەداو بەگەورەییش قسە دەکات بۆ خەڵکی، لە پیاو چاکانیشە.

(٤٧) ئەوسا مەریەم وتی: پەروەردگارا، جا چۆن من منداڵم دەبێت: خۆ کەس توخنم نەکەوتووە، (جوبرەئیل فەرمووی): ویست و فەرمانی خوا هەروایە و چی بوێت، دروستی دەکات، هەر کاتێک شتێکی بوێت تەنها پێی بڵێ ببە، دەستبەجێ دەبێت.

(٤٨) هەروەها خوای گەورە فێری کتێب و نووسین و دانایی و تەورات و ئینجیلی دەکات.

(٤٩) (لە ئایندەدا رایدەگەیەنێت) بەنەوەی ئیسرائیل کە من پێغەمبەرێکم، بۆ لای ئێوە رەوانەکراوم، بەڵگە و نیشانەیەکیشم پێیە لە لایەن پەروەردگارتانەوە، (ئەویش ئەمەیە کە): من لە قوڕ شێوەی باڵندەتان بۆ دروست دەکەم، ئینجا فووی پێدا دەکەم، بەفرمانی خوا یەکسەر، دەبێتە باڵندەیەکی زیندوو و کوێری زکماک و نەخۆشی بەڵەکیی چاک دەکەمەوە بەویستی خوا و مردووانیش زیندوو دەکەمەوە بەفرمانی خوا و هەواڵی ئەو شتانەی کە دەیخۆن و هەڵی دەگرن لە ماڵەکانتاندا پێتان رادەگەینم، بەراستی لەو شتانەدا بەڵگەو نیشانە هەیە بۆتان ئەگەر ئیماندارن.

(٥٠) هەروەها بەراستدانەری ئەو تەوراتەم کە لەبەر دەستمدایە، هاتووم بۆ ئەوەی هەندێک لەو شتانەی لەسەرتان حەرامکراوە (بەفەرمانی خوا) حەلاڵی بکەم و بەڵگەشم بۆ هێناون لەلایەن پەروەردگارتانەوە (لەسەر راستی پێغەمبەرایەتیم) کەواتە لە خوا بترسن و فەرمانبەرداری من بن و بە قسەم بکەن.

(٥١) بەراستی هەر خوا پەروەردگاری منیش و ئێوەشە، کەواتە تەنها ئەو بپەرستن و ملکەچی ئەو بن، ئەمەیە رێبازی راست و دروست.

(٥٢) جا کاتێک عیسا هەستی بە کوفرو بێدینی ئەوانە کرد وتی: کێ پشتیوانمە بۆ لای خوا، (کێ دێت تا پێکەوە بەرنامەی خوا بگەیەنین)، حەوارییەکان وتیان: ئێمەین پشتیوانانی دین و ئاینی خوا، باوەڕی تەواومان بەو خوایە هێناوە، تۆش شایەتی بدە کە بەراستی ئێمە موسڵمان وملکەچ و فەرمانبەردارین.

رَبَّنَآ ءَامَنَّا بِمَآ أَنزَلۡتَ وَٱتَّبَعۡنَا ٱلرَّسُولَ فَٱكۡتُبۡنَا مَعَ
ٱلشَّٰهِدِينَ ﴿٥٣﴾ وَمَكَرُواْ وَمَكَرَ ٱللَّهُۖ وَٱللَّهُ خَيۡرُ
ٱلۡمَٰكِرِينَ ﴿٥٤﴾ إِذۡ قَالَ ٱللَّهُ يَٰعِيسَىٰٓ إِنِّي مُتَوَفِّيكَ وَرَافِعُكَ
إِلَيَّ وَمُطَهِّرُكَ مِنَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ وَجَاعِلُ ٱلَّذِينَ ٱتَّبَعُوكَ
فَوۡقَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ إِلَىٰ يَوۡمِ ٱلۡقِيَٰمَةِۖ ثُمَّ إِلَيَّ مَرۡجِعُكُمۡ
فَأَحۡكُمُ بَيۡنَكُمۡ فِيمَا كُنتُمۡ فِيهِ تَخۡتَلِفُونَ ﴿٥٥﴾ فَأَمَّا ٱلَّذِينَ
كَفَرُواْ فَأُعَذِّبُهُمۡ عَذَابٗا شَدِيدٗا فِي ٱلدُّنۡيَا وَٱلۡأٓخِرَةِ وَمَا
لَهُم مِّن نَّٰصِرِينَ ﴿٥٦﴾ وَأَمَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ
ٱلصَّٰلِحَٰتِ فَيُوَفِّيهِمۡ أُجُورَهُمۡۗ وَٱللَّهُ لَا يُحِبُّ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٥٧﴾
ذَٰلِكَ نَتۡلُوهُ عَلَيۡكَ مِنَ ٱلۡأٓيَٰتِ وَٱلذِّكۡرِ ٱلۡحَكِيمِ ﴿٥٨﴾ إِنَّ
مَثَلَ عِيسَىٰ عِندَ ٱللَّهِ كَمَثَلِ ءَادَمَۖ خَلَقَهُۥ مِن تُرَابٖ ثُمَّ قَالَ
لَهُۥ كُن فَيَكُونُ ﴿٥٩﴾ ٱلۡحَقُّ مِن رَّبِّكَ فَلَا تَكُن مِّنَ ٱلۡمُمۡتَرِينَ ﴿٦٠﴾
فَمَنۡ حَآجَّكَ فِيهِ مِنۢ بَعۡدِ مَا جَآءَكَ مِنَ ٱلۡعِلۡمِ فَقُلۡ تَعَالَوۡاْ نَدۡعُ
أَبۡنَآءَنَا وَأَبۡنَآءَكُمۡ وَنِسَآءَنَا وَنِسَآءَكُمۡ وَأَنفُسَنَا وَأَنفُسَكُمۡ
ثُمَّ نَبۡتَهِلۡ فَنَجۡعَل لَّعۡنَتَ ٱللَّهِ عَلَى ٱلۡكَٰذِبِينَ ﴿٦١﴾

(٥٣) (ئەوسا وتیان): پەروەردگارا ئێمە باوەڕمان هێناوە، بەوەی داتبەزاندووە و ڕەوانەت کردووە، شوێنکەوتەی پێغەمبەرەکەشتین، دە تۆیش لە ڕیزی شایەتەکانی (گەیاندنی بەرنامەکەتدا) تۆمارمان بکە.

(٥٤) (بەڵام دوژمنانیخوا) پیلانیان گێڕا، خوایش پیلانەکانی پووچ کردنەوە، چونکە خوا چاکترین و بەدەسەڵاترین زاتێکەلە هەڵوەشاندنی نەخشە و پیلانی دوژمنانیدا.

(٥٥) (بەیادیان بهێنە) کاتێک خوا فەرمووی: ئەی عیسا من (بەشێوەیەکی ئاسایی) تۆ دەمرێنم پاشان تۆ پایەدارو بەرزو بڵند دەکەمەوە لای خۆم، لە دەستی ناپاکی ئەوانەی کەبێ باوەڕن ڕزگارت دەکەم و پاک ڕاتدەگرم و بەرزیی و بڵندیی دەبەخشم بەوانەی کە شوێنکەوتەی تۆن بەسەر کافراندا هەتا ڕۆژی قیامەت، لەوەودواش گەڕانەوەتان هەر بۆلای منە، ئەوسا دادوەریی و فەرمانڕەوایی دادپەروەرانە دەکەم لە نێوانتاندا لەو شتانەدا کە کێشەتان لەسەری هەبووە و ڕاتان دەربارەی جیاواز بووە.

(٥٦) جا ئەوانەی بێ باوەڕ بوون سزای توند و تیژیان دەدەم لە دنیادا (بە شکستی و سەرشۆڕیان)، لە قیامەتیشدا (بە ژیانی سەختی ناو دۆزەخ)، جا لەوێ کەسیان دەست ناکەوێت کە یاریدەدەرو پشتیوانیان بێت (لە سزای من بیانپارێزێت).

(٥٧) ئەوانەش کە باوەڕیان هێناوە (بە ئاینی ئیسلام) و کارو کردەوە چاکەکانیان ئەنجام داوە، ئەوە خوا بە تەواوی پاداشتیان دەداتەوە، بەڕاستی خوا ستەمکارانی خۆشناوێت.

(٥٨) ئەو هەواڵ و بەسەرهاتانەی کە بەسەرتدا دەیخوێنینەوە (ئەی محمد ﷺ) لە ئایەتەکانی خوایە و لە یادو باسە پڕداناییەکانە.

(٥٩) بەڕاستی نموونەی دروست بوونی عیسا لەلایەن خواوە؛ وەک نموونەی ئادەم وایە کە لە خاک دروستی کرد و لەوەودوا فەرمانیداو پێی وت: ببە (بە ئینسان) ئەویش بوو، (عیسا دایکی هەبوو، ئادەم دایک و باوکیشی نەبوو).

(٦٠) حەقیقەت و ڕاستی هەر ئەوەیە لەلایەن پەروەردگارتەوەیە، کەواتە نەکەیت بچیتە ڕیزی ئەوانەی کە گومان کارکردی هەیە لەسەریان.

(٦١) (دوای ئەوەی کە هەموو ئەو ڕاستیانەت پێگەیشت دەربارەی عیسا)، جا ئەگەر کەسانێک هەر موجادەلەیان کردوو لەسەری ڕۆیشتن و شتی ناڕەوایان دەربارەی عیسا وت، تۆیش پێیان بڵێ: وەرن با کوڕانی ئێمە و کوڕانی ئێوە، ئافرەتانی ئێمە و ئافرەتانی ئێوە، خۆمان و خۆشتان بانگ بکەین و ئامادەبین (لە شوێنێکی تایبەتدا)، پاشان لە خوا بپاڕێینەوە و ئینجا داوا بکەین نەفرین و لەعنەتی خوا دابارێتە سەر درۆزنەکان.

إِنَّ هَٰذَا لَهُوَ ٱلْقَصَصُ ٱلْحَقُّ ۚ وَمَا مِنْ إِلَٰهٍ إِلَّا ٱللَّهُ ۚ وَإِنَّ ٱللَّهَ لَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ ﴿٦٢﴾ فَإِن تَوَلَّوْا فَإِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمٌۢ بِٱلْمُفْسِدِينَ ﴿٦٣﴾ قُلْ يَٰٓأَهْلَ ٱلْكِتَٰبِ تَعَالَوْا إِلَىٰ كَلِمَةٍ سَوَآءٍۭ بَيْنَنَا وَبَيْنَكُمْ أَلَّا نَعْبُدَ إِلَّا ٱللَّهَ وَلَا نُشْرِكَ بِهِۦ شَيْـًٔا وَلَا يَتَّخِذَ بَعْضُنَا بَعْضًا أَرْبَابًا مِّن دُونِ ٱللَّهِ ۚ فَإِن تَوَلَّوْا فَقُولُوا ٱشْهَدُوا بِأَنَّا مُسْلِمُونَ ﴿٦٤﴾ يَٰٓأَهْلَ ٱلْكِتَٰبِ لِمَ تُحَآجُّونَ فِىٓ إِبْرَٰهِيمَ وَمَآ أُنزِلَتِ ٱلتَّوْرَىٰةُ وَٱلْإِنجِيلُ إِلَّا مِنۢ بَعْدِهِۦٓ ۚ أَفَلَا تَعْقِلُونَ ﴿٦٥﴾ هَٰٓأَنتُمْ هَٰٓؤُلَآءِ حَٰجَجْتُمْ فِيمَا لَكُم بِهِۦ عِلْمٌ فَلِمَ تُحَآجُّونَ فِيمَا لَيْسَ لَكُم بِهِۦ عِلْمٌ ۚ وَٱللَّهُ يَعْلَمُ وَأَنتُمْ لَا تَعْلَمُونَ ﴿٦٦﴾ مَا كَانَ إِبْرَٰهِيمُ يَهُودِيًّا وَلَا نَصْرَانِيًّا وَلَٰكِن كَانَ حَنِيفًا مُّسْلِمًا وَمَا كَانَ مِنَ ٱلْمُشْرِكِينَ ﴿٦٧﴾ إِنَّ أَوْلَى ٱلنَّاسِ بِإِبْرَٰهِيمَ لَلَّذِينَ ٱتَّبَعُوهُ وَهَٰذَا ٱلنَّبِىُّ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا ۗ وَٱللَّهُ وَلِىُّ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴿٦٨﴾ وَدَّت طَّآئِفَةٌ مِّنْ أَهْلِ ٱلْكِتَٰبِ لَوْ يُضِلُّونَكُمْ وَمَا يُضِلُّونَ إِلَّآ أَنفُسَهُمْ وَمَا يَشْعُرُونَ ﴿٦٩﴾ يَٰٓأَهْلَ ٱلْكِتَٰبِ لِمَ تَكْفُرُونَ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ وَأَنتُمْ تَشْهَدُونَ ﴿٧٠﴾

(٦٢) بەراستی هەر ئەمەیە بەسەرهاتی راست و دروست (دەربارەی عیسا و دایکی)، هیچ خوایەک نیە جگە لە(الله)، بێگومان ئەو(الله)یە هەر خۆی بالادەست و دانایە.

(٦٣) (لەگەڵ ئەم هەموو بەڵگە و راستیانەدا) ئەگەر هەر روویان وەرگێڕاو پشتیان تێکرد (ئەوە بزانە ئەوانە راستیخوازنین)، خوایش زاناو ئاگایە بەوانەی کە تۆوی تاوان و خراپە دەچێنن.

(٦٤) (ئەی محمد ﷺ) بڵێ: ئەی ئەوانەی کتێبتان بۆ رەوانەکراوە وەرن بەدەم بانگەواز و بەرنامەیەکەوە کە هاوبەش و هاوسەنگە لە نێوان ئێمەش و ئێوەشدا (ئەویش ئەمەیە): جگە لە (الله) کەسی تر نەپەرستین، هیچ جۆرە هاوەڵێکی بۆ بڕیار نەدەین، هیچ لایەکمان لاکەی ترمان (بەپیرۆز و فەرمانڕەوا دانەنێین) لەجیاتی ئەو زاتە و نەیپەرستین (خۆ ئەگەر لەم بانگەوازەدا) سەرپێچیان کردو گوێیان پێنەدا، ئەوە پێیان بڵێ: کە ئێوە بەشایەت بن کە ئێمە موسڵمانین و ملکەچی فەرمانی پەروەردگارین.

(٦٥) ئەی خاوەن کتێبەکان، ئێوە بۆ لە ئیبراهیم دەدوێن و (هەریەکەتان وادادەنێت کە لەسەر ئاینی ئەوە) خۆ تەورات و ئینجیل دوای ئەو رەوانە کراون، ئەوە بۆ عەقڵ و ژیریتان ناخەنەکارو تاکەی ژیرنابن ؟!

(٦٦) ئەوە ئێوەن موجادەلەو باس وخواستان لەسەر ئەو شتانە دەکرد کە زانیاریتان دەربارەی هەبوو..کەوابوو بۆچی دەم لەو شتانەشەوە دەدەن کە هیچ زانیاریتان دەربارەی نیە؟ دیارە هەر خوا ئەو شتانە دەزانێت، ئێوە نایزانن.

(٦٧) (ئاشکرایە) کە ئیبراهیم نە جوولەکە بووە و نەگاور، بەڵکو ملکەچ و فەرمانبەردارو موسڵمان بووە و لە دەستەی موشریک و هاوەڵگەران نەبووە.

(٦٨) نزیکترین کەس لە ئیبراهیمەوە: ئەو کەسانەن کە لە سەردەمی خۆیدا شوێنی کەوتبوون، هەروەها ئەم پێغەمبەرەش ﷺ و ئەوانەی کە باوەڕیان هێناوە (بە پێغەمبەرایەتی ئیبراهیم و موسا و عیسا ومحمد و هەموو پێغەمبەران بەگشتی علیهم السلام)، بێگومان خوا یارو یاوەرو پشتگیری ئیماندارانە.

(٦٩) دەستەیەک لەخاوەن کتێبەکان ئاواتەخوازن و(لە هەوڵدان)کە گومڕاتان بکەن، لەکاتێکدا ئەوانە هەر خۆیان گومڕا دەکەن و هەستیشی پێناکەن و(خۆیان دەخەڵەتێنن).

(٧٠) ئەی خاوەن کتێبەکان بۆ بڕواتان نیە بەئایەتەکانی خوا (کە هەمووی بەڵگەن لەسەر راستی پێغەمبەرایەتی محمد ﷺ) لەکاتێکدا ئێوە بەئاشکرا (نیشانەی پێغەمبەرایەتی ئەو) دەبینن (لە کتێبەکانتاندا).

يَٰٓأَهْلَ ٱلْكِتَٰبِ لِمَ تَلْبِسُونَ ٱلْحَقَّ بِٱلْبَٰطِلِ وَتَكْتُمُونَ ٱلْحَقَّ وَأَنتُمْ تَعْلَمُونَ ﴿٧١﴾ وَقَالَت طَّآئِفَةٌ مِّنْ أَهْلِ ٱلْكِتَٰبِ ءَامِنُوا۟ بِٱلَّذِىٓ أُنزِلَ عَلَى ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَجْهَ ٱلنَّهَارِ وَٱكْفُرُوٓا۟ ءَاخِرَهُۥ لَعَلَّهُمْ يَرْجِعُونَ ﴿٧٢﴾ وَلَا تُؤْمِنُوٓا۟ إِلَّا لِمَن تَبِعَ دِينَكُمْ قُلْ إِنَّ ٱلْهُدَىٰ هُدَى ٱللَّهِ أَن يُؤْتَىٰٓ أَحَدٌ مِّثْلَ مَآ أُوتِيتُمْ أَوْ يُحَآجُّوكُمْ عِندَ رَبِّكُمْ قُلْ إِنَّ ٱلْفَضْلَ بِيَدِ ٱللَّهِ يُؤْتِيهِ مَن يَشَآءُ وَٱللَّهُ وَٰسِعٌ عَلِيمٌ ﴿٧٣﴾ يَخْتَصُّ بِرَحْمَتِهِۦ مَن يَشَآءُ وَٱللَّهُ ذُو ٱلْفَضْلِ ٱلْعَظِيمِ ﴿٧٤﴾ ۞ وَمِنْ أَهْلِ ٱلْكِتَٰبِ مَنْ إِن تَأْمَنْهُ بِقِنطَارٍ يُؤَدِّهِۦٓ إِلَيْكَ وَمِنْهُم مَّنْ إِن تَأْمَنْهُ بِدِينَارٍ لَّا يُؤَدِّهِۦٓ إِلَيْكَ إِلَّا مَا دُمْتَ عَلَيْهِ قَآئِمًا ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ قَالُوا۟ لَيْسَ عَلَيْنَا فِى ٱلْأُمِّيِّۦنَ سَبِيلٌ وَيَقُولُونَ عَلَى ٱللَّهِ ٱلْكَذِبَ وَهُمْ يَعْلَمُونَ ﴿٧٥﴾ بَلَىٰ مَنْ أَوْفَىٰ بِعَهْدِهِۦ وَٱتَّقَىٰ فَإِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلْمُتَّقِينَ ﴿٧٦﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَشْتَرُونَ بِعَهْدِ ٱللَّهِ وَأَيْمَٰنِهِمْ ثَمَنًا قَلِيلًا أُو۟لَٰٓئِكَ لَا خَلَٰقَ لَهُمْ فِى ٱلْءَاخِرَةِ وَلَا يُكَلِّمُهُمُ ٱللَّهُ وَلَا يَنظُرُ إِلَيْهِمْ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ وَلَا يُزَكِّيهِمْ وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿٧٧﴾



(٧١) ئەی خاوەن کتێبەکان بۆچی بەرگی بەتاڵ و ناحەقی دەکەن بەبەری حەق و راستیداو حەق و راستی دەشارنەوە، لەکاتێکدا خۆتان چاک دەزانن (کەحەق و راستی کامەیە).

(٧٢) دەستەیەک لە خاوەن کتێبەکان (جووەکان) وتیان بەتاقمێکیان: ئێوە لە سەرەتای رۆژدا (بەدرۆوە) ئیمان و باوەڕ بهێنن بەو(قورئانەی) بۆ ئیماندااران رەوانە کراوە، بەلام لەکۆتایی رۆژداو دەمەو ئێوارە پەشیمان ببنەوە(تا دوودڵی و گومانیان تێدا دروست ببێت) بۆ ئەوەی پاشگەز ببنەوە.

(٧٣) (هەروەها دەڵێن): بروا مەکەن و متمانە مەکەن بەکەس جگە بەوکەسانەی کە شوێنی ئاینی ئێوە کەوتوون! (ئەی محمد ﷺ پێیان) بڵێ: کە بەراستی هەر هیدایەت و ڕێنموویی خوایی هیدایەت و ڕێنموویی‌یە، (کەچی جووەکان بەیەکتر دەڵێن): دان بەوەدا مەنێن کەکەس وەکو ئێوەی پێبەخشراوە، باسی (تەورات و دواهەمین پێغەمبەریش مەکەن)!! تا لای پەروەردگارتان (سبەی لە قیامەتدا) قسەیان زاڵ نەبێت بەسەرتاندا!! (ئەی محمد ﷺ تۆش) بڵێ: بەراستی هەرچی ڕێزو بەخشش و فەزڵ هەیە بەدەست خوایەو دەیبەخشێت بەو کەسانەی کە دەیەوێت و (شایستەن) و خوا فراوانگیرو زانایە.

(٧٤) ئەو خوایە رەحمەت و میهرەبانیی خۆی تایبەت دەکات بۆ هەر کەسێک بیەوێت و(شایستە بێت) و خوا خاوەنی ڕێزو بەخشش و فەزڵی زۆر گەورە و بێ ئەندازەیە.

(٧٥) لە شوێنکەوتووانی کتێبە ئاسمانیەکان کەسانێک هەن ئەگەر ماڵ و داراییەکی زۆری بەئەمانەت لەلا دابنێیت (هەر کاتێک داوای بکەیت) بۆت دەگێڕێتەوە بەتەواویی، هەشیانە ئەگەر دینارێکی بەئەمانەت لادابنێیت بۆت نایگێڕێتەوە مەگەر بە سەریەوە راوەستابیت و کۆڵی لێنەدەیت، ئەوانە بۆیە وادەکەن چونکە دەڵێن: لە بەرامبەر دەستەی نەخوێندەواراندا (مەبەستیان موسڵمانانە) لێپرسراو نابین (ئەگەر فێڵیان لێبکەین و ماڵیان بخۆین)، ئەوانە بەدەم خواوە درۆ هەڵدەبەستن و دەشزانن کە درۆ دەکەن...

(٧٦) نەخێر وانیە: هەر کەس ئەو پەیمانەی کە داویەتی بەخوا جێبەجێی کردبێت و خۆی پاراستبێت لە حەرام، ئەوە بەراستی خوا پارێزکاران و دینداارانی خۆشدەوێت .

(٧٧) بەراستی ئەوانەی کە پەیمانی خواو سوێندەکانیان بەنرخێکی کەم دەفرۆشن (لە پلەو پایەی دنیایی، پارەوپول و سامان، ئەڵبەتە هەرچەندە بێت هەرکەمە) ئەوانە لە دوارۆژدا هیچ بەشێکیان نابێت (لە سۆزو میهرەبانی خوا)، هەروەها لە رۆژی قیامەتدا خوا نایاندوێنێت و تەماشایان ناکات (لە چڵک و پیسی گوناهـ) خاوێنیان ناکات و سزای پڕ ئێش و ئازاریش بۆیان ئامادەیە.

وَإِنَّ مِنْهُمْ لَفَرِيقًا يَلْوُونَ أَلْسِنَتَهُم بِالْكِتَابِ لِتَحْسَبُوهُ مِنَ الْكِتَابِ وَمَا هُوَ مِنَ الْكِتَابِ وَيَقُولُونَ هُوَ مِنْ عِندِ اللَّهِ وَمَا هُوَ مِنْ عِندِ اللَّهِ وَيَقُولُونَ عَلَى اللَّهِ الْكَذِبَ وَهُمْ يَعْلَمُونَ ﴿٧٨﴾ مَا كَانَ لِبَشَرٍ أَن يُؤْتِيَهُ اللَّهُ الْكِتَابَ وَالْحُكْمَ وَالنُّبُوَّةَ ثُمَّ يَقُولَ لِلنَّاسِ كُونُوا عِبَادًا لِّي مِن دُونِ اللَّهِ وَلَٰكِن كُونُوا رَبَّانِيِّينَ بِمَا كُنتُمْ تُعَلِّمُونَ الْكِتَابَ وَبِمَا كُنتُمْ تَدْرُسُونَ ﴿٧٩﴾ وَلَا يَأْمُرَكُمْ أَن تَتَّخِذُوا الْمَلَائِكَةَ وَالنَّبِيِّينَ أَرْبَابًا ۗ أَيَأْمُرُكُم بِالْكُفْرِ بَعْدَ إِذْ أَنتُم مُّسْلِمُونَ ﴿٨٠﴾ وَإِذْ أَخَذَ اللَّهُ مِيثَاقَ النَّبِيِّينَ لَمَا آتَيْتُكُم مِّن كِتَابٍ وَحِكْمَةٍ ثُمَّ جَاءَكُمْ رَسُولٌ مُّصَدِّقٌ لِّمَا مَعَكُمْ لَتُؤْمِنُنَّ بِهِ وَلَتَنصُرُنَّهُ ۚ قَالَ أَأَقْرَرْتُمْ وَأَخَذْتُمْ عَلَىٰ ذَٰلِكُمْ إِصْرِي ۖ قَالُوا أَقْرَرْنَا ۚ قَالَ فَاشْهَدُوا وَأَنَا مَعَكُم مِّنَ الشَّاهِدِينَ ﴿٨١﴾ فَمَن تَوَلَّىٰ بَعْدَ ذَٰلِكَ فَأُولَٰئِكَ هُمُ الْفَاسِقُونَ ﴿٨٢﴾ أَفَغَيْرَ دِينِ اللَّهِ يَبْغُونَ وَلَهُ أَسْلَمَ مَن فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ طَوْعًا وَكَرْهًا وَإِلَيْهِ يُرْجَعُونَ ﴿٨٣﴾

(٧٨) بەراستی دەستەیەکیش لەوانەی (کە لە چەند ئایەتی پێشوودا باسکران واتە جووەکان) زمانیان بادەدەن و بەجۆرێک شت دەڵێن، گوایە (تەورات) دەخوێننەوە، بۆ ئەوەی (ئێوە چەواشە بکەن و) وا بنوێنن کە ئەو کتێبە دەور دەکەنەوە، لەحاڵێکدا ئەوەی دەیخوێننەوە لەو کتێبە نیە (زۆرجار) دەڵێن: ئەوەی کە دەیخوێنین هەر ئەوەیە خوا رەوانەی کردووە، لە راستیدا هەرگیز ئەوە لەلایەن خواوە نیە و بەدەم خواوە درۆ هەڵدەبەستن و دەشزانن کە درۆ و بوختان دەکەن.

(٧٩) بۆ هیچ ئادەمیزاد و کەسێک نەگونجاوە کە خوا کتێبی ئاسمانی و فەرمانڕەوایی و پێغەمبەرایەتی پێببەخشێت، لەوەودوا بەخەڵکی بڵێت: وەرن ببنە عەبد و بەندەی من لە جیاتی ئەوەی بەندە و عەبدی خوا بن، بەڵکو (بەخەڵکیان وتووە) هەوڵ بدەن بۆ خوا بژین و لێبڕاو بن، بۆ رەزامەندی پەروەردگار هەوڵ بدەن، بەوەش دەبنە خواناس و ڕەبانی کە بەرنامەی خوا فێری خەڵکی بکەن و خۆشتان بەردەوام هەوڵ بدەن فێری ببن.

(٨٠) (هیچ پێغەمبەرێک) فرمانی ئەوەی نەداوە کە فریشتەکان و پێغەمبەران بکەن بە پەروەردگار (هەرگیز کاری لەو جۆرە لەوان ناوەشێتەوە) ئایا راستە فرمانی بێباوەڕیی و کوفرتان پێ بدات دوای ئەوەی کە ئێوە موسڵمانن و ملکەچی پەروەردگارن ؟!

(٨١) (یادیان بێنە) کاتێک خوا پەیمانی لە یەکە یەکەی پێغەمبەران وەرگرت کاتێک کتێب و دانایی پێببەخشین بەوەی کە ئەگەر: لە ئایندەدا پێغەمبەرێکم بۆ رەوانە کردن و بەراستدانەری ئەوەی ئێوەش بوو، ئەوە دەبێت باوەڕی پێ بهێنن و پشتگیری بکەن، ئینجا خوا فەرمووی: ئایا بڕیارتانداو پەیمانی منتان بەو جۆرە وەرگرت کە پێم راگەیاندن؟ وتیان: بڕیارمانداو(هەروا دەکەین) ئەوسا خوا پێی فەرموون: دە بەشایەت بن و منیش لەگەڵتان یەکێکم لە شایەتەکان.

(٨٢) جا ئەوەی پشتی هەڵکردو سەرپێچی کرد دوای ئەو پەیمانە، ئەوە ئیتر هەر ئەوانەن فاسق و گوناهکار.

(٨٣) ئایا ئەوانە بێجگە لە ئاینی خوا ئاینێکی تریان دەوێت؟! لەکاتێکدا کە هەرچی لەئاسمانەکان و زەویدایە بە رەزامەندیی بێت یان بەناچاریی تەسلیم و ملکەچی پەروەردگارن، هەموانیش هەر بۆ لای ئەو دەگەڕێنرێنەوە.

قُلْ ءَامَنَّا بِاللَّهِ وَمَآ أُنزِلَ عَلَيْنَا وَمَآ أُنزِلَ عَلَىٰٓ إِبْرَٰهِيمَ وَإِسْمَٰعِيلَ وَإِسْحَٰقَ وَيَعْقُوبَ وَالْأَسْبَاطِ وَمَآ أُوتِيَ مُوسَىٰ وَعِيسَىٰ وَالنَّبِيُّونَ مِن رَّبِّهِمْ لَا نُفَرِّقُ بَيْنَ أَحَدٍ مِّنْهُمْ وَنَحْنُ لَهُۥ مُسْلِمُونَ ﴿٨٤﴾ وَمَن يَبْتَغِ غَيْرَ الْإِسْلَٰمِ دِينًا فَلَن يُقْبَلَ مِنْهُ وَهُوَ فِى الْءَاخِرَةِ مِنَ الْخَٰسِرِينَ ﴿٨٥﴾ كَيْفَ يَهْدِى اللَّهُ قَوْمًا كَفَرُوا۟ بَعْدَ إِيمَٰنِهِمْ وَشَهِدُوٓا۟ أَنَّ الرَّسُولَ حَقٌّ وَجَآءَهُمُ الْبَيِّنَٰتُ ۚ وَاللَّهُ لَا يَهْدِى الْقَوْمَ الظَّٰلِمِينَ ﴿٨٦﴾ أُو۟لَٰٓئِكَ جَزَآؤُهُمْ أَنَّ عَلَيْهِمْ لَعْنَةَ اللَّهِ وَالْمَلَٰٓئِكَةِ وَالنَّاسِ أَجْمَعِينَ ﴿٨٧﴾ خَٰلِدِينَ فِيهَا لَا يُخَفَّفُ عَنْهُمُ الْعَذَابُ وَلَا هُمْ يُنظَرُونَ ﴿٨٨﴾ إِلَّا الَّذِينَ تَابُوا۟ مِنۢ بَعْدِ ذَٰلِكَ وَأَصْلَحُوا۟ فَإِنَّ اللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿٨٩﴾ إِنَّ الَّذِينَ كَفَرُوا۟ بَعْدَ إِيمَٰنِهِمْ ثُمَّ ازْدَادُوا۟ كُفْرًا لَّن تُقْبَلَ تَوْبَتُهُمْ وَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ الضَّآلُّونَ ﴿٩٠﴾ إِنَّ الَّذِينَ كَفَرُوا۟ وَمَاتُوا۟ وَهُمْ كُفَّارٌ فَلَن يُقْبَلَ مِنْ أَحَدِهِم مِّلْءُ الْأَرْضِ ذَهَبًا وَلَوِ افْتَدَىٰ بِهِۦٓ ۗ أُو۟لَٰٓئِكَ لَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ وَمَا لَهُم مِّن نَّٰصِرِينَ ﴿٩١﴾

(٨٤) (ئەی محمد ﷺ ئەی ئیماندار) بڵێ: باوەڕمان هێناوە بەخواو بەوەی بۆمان نێرراوەتە خوارەوە و بەوەش کە نێرراوەتە خوارەوە بۆ سەر ئیبراهیم و ئیسماعیل و ئیسحاق و یەعقوب و نەوەکانی و بەوەش کە دراوە بە موساو عیساو پێغەمبەران لەلایەن پەروەردگاریانەوە و ئێمە جیاوازیی ناکەین لەنێوان هیچ کامیانداو هەموومان تەسلیم و ملکەچی ئەو پەروەردگارەین.

(٨٥) جانەوەی بێجگە لەئاینی ئیسلام پەیڕەوی هەر ئاینێکی تر بکات لێی وەرناگیرێت، لەقیامەتیشدا لە خەسارەتمەندو زەرەرمەندانە.

(٨٦) چۆن خوا گەلێک هیدایەت دەدات کە دوای ئەوەی باوەڕیان هێنا، هەڵگەڕانەوە و کافر بوون ؟ لە حاڵێکدا شایەتییان دابوو کەئەم پێغەمبەرە حەقەو چەندەها بەڵگەو نیشانەشیان بۆ هاتبوو (لەسەر راستی محمد ﷺ)، خوای گەورەش هیدایەت و رێنموویی ئەو دەستەو تاقمە ستەمکارە نادات.

(٨٧) ئا ئەو ستەمکارانە پاداشت و تۆڵەیان ئەوەیە: نەفرینی خواو فریشتە و هەموو خەڵکییان لەسەرە بەگشتی..

(٨٨) لەناو ئەو خەشم و نەفرینەدا دەمێننەوە و سزا لەسەریان سووک ناکرێت و مۆڵەتیش نادرێن.

(٨٩) مەگەر کەسانێک کە فریای خۆیان کەوتبن و تەوبەیان کردبێت لە دوای ئەو لادان و یاخیی بوونەیان و چاکسازیشیان کردبێت، ئەوە بەراستی خوا بۆ ئەوانە لێخۆشبوو و میهرەبانە.

(٩٠) بەراستی ئەوانەی دوای باوەڕ هێنانیان کافر بوون و لەوەودوا زیاتر رۆچوون لە کوفرو بێدینیدا، ئەوانە پەشیمانی و تەوبەیان هەرگیز لێ وەرناگیرێت، ئا ئەوانە دەستەی گومڕاو سەر لێشێواوەکانن.

(٩١) بەڕاستی ئەوانەی بێ باوەڕ بوون و بەبێ باوەڕیی مردوون، (ئەگەر) هەریەکەیان بتوانێت پڕ بەپڕی زەوی ئاڵتون بهێنێت و بیکات بەفیدیەی خۆی هەرگیز لێی وەرناگیرێت، ئەوانە سزای بە ئێش و ئازار بۆیان ئامادەیە و کەسیش نییە پشتیوانییان لێ بکات و فریایان بکەوێت.



لَن تَنَالُوا۟ ٱلْبِرَّ حَتَّىٰ تُنفِقُوا۟ مِمَّا تُحِبُّونَ ۚ وَمَا تُنفِقُوا۟ مِن شَىْءٍ فَإِنَّ ٱللَّهَ بِهِۦ عَلِيمٌ ﴿٩٢﴾ ۞ كُلُّ ٱلطَّعَامِ كَانَ حِلًّا لِّبَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ إِلَّا مَا حَرَّمَ إِسْرَٰٓءِيلُ عَلَىٰ نَفْسِهِۦ مِن قَبْلِ أَن تُنَزَّلَ ٱلتَّوْرَىٰةُ ۗ قُلْ فَأْتُوا۟ بِٱلتَّوْرَىٰةِ فَٱتْلُوهَآ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ ﴿٩٣﴾ فَمَنِ ٱفْتَرَىٰ عَلَى ٱللَّهِ ٱلْكَذِبَ مِنۢ بَعْدِ ذَٰلِكَ فَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلظَّٰلِمُونَ ﴿٩٤﴾ قُلْ صَدَقَ ٱللَّهُ ۗ فَٱتَّبِعُوا۟ مِلَّةَ إِبْرَٰهِيمَ حَنِيفًا وَمَا كَانَ مِنَ ٱلْمُشْرِكِينَ ﴿٩٥﴾ إِنَّ أَوَّلَ بَيْتٍ وُضِعَ لِلنَّاسِ لَلَّذِى بِبَكَّةَ مُبَارَكًا وَهُدًى لِّلْعَٰلَمِينَ ﴿٩٦﴾ فِيهِ ءَايَٰتٌۢ بَيِّنَٰتٌ مَّقَامُ إِبْرَٰهِيمَ ۖ وَمَن دَخَلَهُۥ كَانَ ءَامِنًا ۗ وَلِلَّهِ عَلَى ٱلنَّاسِ حِجُّ ٱلْبَيْتِ مَنِ ٱسْتَطَاعَ إِلَيْهِ سَبِيلًا ۚ وَمَن كَفَرَ فَإِنَّ ٱللَّهَ غَنِىٌّ عَنِ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٩٧﴾ قُلْ يَٰٓأَهْلَ ٱلْكِتَٰبِ لِمَ تَكْفُرُونَ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ وَٱللَّهُ شَهِيدٌ عَلَىٰ مَا تَعْمَلُونَ ﴿٩٨﴾ قُلْ يَٰٓأَهْلَ ٱلْكِتَٰبِ لِمَ تَصُدُّونَ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ مَنْ ءَامَنَ تَبْغُونَهَا عِوَجًا وَأَنتُمْ شُهَدَآءُ ۗ وَمَا ٱللَّهُ بِغَٰفِلٍ عَمَّا تَعْمَلُونَ ﴿٩٩﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ إِن تُطِيعُوا۟ فَرِيقًا مِّنَ ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْكِتَٰبَ يَرُدُّوكُم بَعْدَ إِيمَٰنِكُمْ كَٰفِرِينَ ﴿١٠٠﴾

(٩٢) ئێوە هەرگیز ناگەنە پلەی چاکیی و چاکەکاریی هەتا لەو شتانەی کە خۆشتان دەوێت نەبەخشن، هەر شتێکیش ببەخشن ئەوە خوا ئاگاو زانایە پێی(لێی ون نابێت و بێ پاداشت نابێت).

(٩٣) هەرچی خۆراک هەیە بۆ نەوەی ئیسرائیل حەلاڵ بوو مەگەر ئەوەی کە یەعقوب خۆی لەسەر خۆی حەرام کردبوو پێش ناردنی تەورات، پێیان بڵێ: دە ئێوە تەورات بهێنن و بیخوێننەوە ئەگەر راستگۆن (دیارەکە جولەکە هەر لە خۆیانەوە دەمبازی دەکەن وقسە رێکدەخەن و شت حەرامدەکەن).

(٩٤) جائیتر دوای ئەو هەموو روونکردنەوانە ئەوەی بەدەم خواوە درۆ هەڵبەستێت، ئائەوانە هەر ستەمکارن.

(٩٥) (ئەی پێغەمبەرﷺ پێیان) بڵێ: خوای گەورە لە هەموو فەرمایشتەکانیدا راستی فەرمووە، کەواتە شوێنی ئاین و بەرنامەی ئیبراهیم بکەون کە پاکو دروست و فەرمانبەردارە و ئەو هەرگیز لە موشریک و هاوەڵگەران نەبووە.

(٩٦) بەڕاستی یەکەم خانە و ماڵ و مەنزڵگەیەک کە بۆ خەڵکی دانرا لەسەر زەوی (بۆ خواپەرستی) ئەوەیە لە مەککەدایە، کە پیرۆزە و هیدایەت و رێنموویی بەخشە بۆ هەموو خەڵکی جیهان.

(٩٧) لەو ماڵەدا (کەعبە) نیشانە و بەڵگەی زۆر و ئاشکرا هەیە، کە یەکێکیان شوێنی تایبەتی خواپەرستیی ئیبراهیمە، هەروەها ئەوەی بچێتە ناوی پێویستە ئەمین و ئاسودەبێت، لە هەموو دەستدرێژیەک، جا خوای گەورەش بڕیاریداوە لەسەر خەڵکی حەج و سەردانی(بیت الحرام) بکەن بە تەنها ئەوانەی کە توانای (دارایی و تەندروستیان) هەیە، جا ئەوەی کە باوەڕی نەهێناوە، ئەوە با بزانێت بەڕاستی خوا بێ نیازە لە هەموو خەڵکان (پێویستی بە چاکە و پەرستنی کەس نیە).

(٩٨) ئەی پێغەمبەرﷺ بە خاوەنانی کتێب بڵێ: بۆچی ئێوە باوەڕ ناکەن بە ئایەتەکانی خوا، خۆ خوا شایەتە لەسەر هەموو ئەو کارو کردەوانەی کە ئەنجامی دەدەن.

(٩٩) (هەروەها) بڵێ: ئەی خاوەنانی کتێب بۆ رێدەگرن لە بڵاو بوونەوەی ئایینی خواو دەتانەوێت ئەوەی باوەڕی هێناوە رێبازی دینداری بە چەوتی بگرێت؟ لەکاتێکدا خۆتان شایەتن و چاک دەزانن (ئەوە راست نیە و چەوتە) دڵنیاش بن کە خوا غافڵ و بێ ئاگا نیە لەو شتانەی کە دەیکەن.

(١٠٠) ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە ئەگەر گوێڕایەڵی هەندێک لەوانە بن کە کتێبی (ئاسمانییان) پێدراوە، دوای ئەوەی کە ئێوە باوەڕتان هێناوە، دەتانگێڕنەوە سەر رێبازی کوفرو بێباوەڕی.

وَكَيْفَ تَكْفُرُونَ وَأَنتُمْ تُتْلَىٰ عَلَيْكُمْ ءَايَٰتُ ٱللَّهِ وَفِيكُمْ رَسُولُهُۥ ۗ وَمَن يَعْتَصِم بِٱللَّهِ فَقَدْ هُدِىَ إِلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ ﴿١٠١﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ حَقَّ تُقَاتِهِۦ وَلَا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَأَنتُم مُّسْلِمُونَ ﴿١٠٢﴾ وَٱعْتَصِمُوا۟ بِحَبْلِ ٱللَّهِ جَمِيعًا وَلَا تَفَرَّقُوا۟ ۚ وَٱذْكُرُوا۟ نِعْمَتَ ٱللَّهِ عَلَيْكُمْ إِذْ كُنتُمْ أَعْدَآءً فَأَلَّفَ بَيْنَ قُلُوبِكُمْ فَأَصْبَحْتُم بِنِعْمَتِهِۦٓ إِخْوَٰنًا وَكُنتُمْ عَلَىٰ شَفَا حُفْرَةٍ مِّنَ ٱلنَّارِ فَأَنقَذَكُم مِّنْهَا ۗ كَذَٰلِكَ يُبَيِّنُ ٱللَّهُ لَكُمْ ءَايَٰتِهِۦ لَعَلَّكُمْ تَهْتَدُونَ ﴿١٠٣﴾ وَلْتَكُن مِّنكُمْ أُمَّةٌ يَدْعُونَ إِلَى ٱلْخَيْرِ وَيَأْمُرُونَ بِٱلْمَعْرُوفِ وَيَنْهَوْنَ عَنِ ٱلْمُنكَرِ ۚ وَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُفْلِحُونَ ﴿١٠٤﴾ وَلَا تَكُونُوا۟ كَٱلَّذِينَ تَفَرَّقُوا۟ وَٱخْتَلَفُوا۟ مِنۢ بَعْدِ مَا جَآءَهُمُ ٱلْبَيِّنَٰتُ ۚ وَأُو۟لَٰٓئِكَ لَهُمْ عَذَابٌ عَظِيمٌ ﴿١٠٥﴾ يَوْمَ تَبْيَضُّ وُجُوهٌ وَتَسْوَدُّ وُجُوهٌ ۚ فَأَمَّا ٱلَّذِينَ ٱسْوَدَّتْ وُجُوهُهُمْ أَكَفَرْتُم بَعْدَ إِيمَٰنِكُمْ فَذُوقُوا۟ ٱلْعَذَابَ بِمَا كُنتُمْ تَكْفُرُونَ ﴿١٠٦﴾ وَأَمَّا ٱلَّذِينَ ٱبْيَضَّتْ وُجُوهُهُمْ فَفِى رَحْمَةِ ٱللَّهِ هُمْ فِيهَا خَٰلِدُونَ ﴿١٠٧﴾ تِلْكَ ءَايَٰتُ ٱللَّهِ نَتْلُوهَا عَلَيْكَ بِٱلْحَقِّ ۗ وَمَا ٱللَّهُ يُرِيدُ ظُلْمًا لِّلْعَٰلَمِينَ ﴿١٠٨﴾

(١٠١) جا ئێوە چۆن کافر دەبن لەکاتێکدا کە ئایەتەکانی خواتان بەسەردا دەخوێنرێتەوە و پێغەمبەرەکەی لەناوتاندایە (دوای وەفاتیشی ﷺ بەسیرەتی پاکْ و بێگەردی هەر لەناوماندایە) جا ئەوەی پشت بەخوا ببەستێت و پەیڕەوی لە بەرنامەکەی بکات، ئەوە بەڕاستی بۆ ڕێگەو ڕێبازێکی ڕاست و دروست هیدایەت دراوە.

(١٠٢) ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە، لە خوا بترسن و پارێزکاربن بەشێوەیەکی وا کە شایستەی ئەو زاتەیە و هەمیشە پابەند و دامەزراو بن لەسەر ئیسلامەتی، بۆ ئەوەی هەر کاتێکْ مردن بە ئیمان و ئیسلامەتی نەبێت نەمرن.

(١٠٣) (هەوڵ بدەن) هەر هەموتان بە توندی دەست بگرن بە ئاینی خواوەو پەرت و بڵاو مەبن ، یادی نازو نیعمەتی خوا بکەنەوە لەسەرتان، (چونکە) کاتی خۆی دوژمنی یەکتر بوون، ئەوە بوو دڵەکانتانی بەهۆی نیعمەتی (ئیسلامەوە) پەیوەست کرد بەیەکەوە و هەموو بوونە برای یەکتر (هەروەها ئەو کاتە) ئێوە لەسەر لێواری چاڵێکی ئاگر وەستا بوون و(خەریکْ بوو بکەونە ناوی)، بەڵام خوا (بەڕەحم ومیهرەبانی خۆی) لەو ئاگرە رزگاری کردن، ئابەو شێوەیە خوا ئایەتەکانی خۆیتان بۆ روون دەکاتەوە، بۆ ئەوەی هیدایەت وەربگرن.

(١٠٤) پێویستە لە ئێوە ئومەتێک پێکْ بێت، یاخود با هەمووتان ئومەتێکْ بن کە بانگەواز بکەن بۆ خێرو چاکە، فەرمان بدەن بەهەموو کارێکی باوو دروست، قەدەغەی هەموو نادروستیەکْ بکەن، ئا ئەوانە هەر سەرفرازن.

(١٠٥) نەکەن وەکو ئەوکەسانە بن کە ناکۆکی و دووبەرەکیان لەناودا بەرپابوو، لەیەکتر دابڕان، دوای ئەوەی ئەوو هەموو بەڵگەو نیشانە روونەیان بۆ هاتبوو(کە سەرکەوتن لە یەکْ ڕیزیدایە)، ئا ئەوانە سزایەکی گەورە و سەخت چاوەڕێیانە.

(١٠٦) رۆژێکْ دێت رووخسارانێکْ سپی دەبن و رووخسارانێکْ رەش هەڵدەگەرێن، جا ئەوانەی کە رووخساریان رەش هەڵگەڕاوە (پێیان دەوترێت): باشە، ئەوە ئێوە پاش ئیمانداریی، پەشیمان بوونەوە و رێبازی کوفرتان گرتەبەر؟! دە بچێژن سزاو ئازار بەهۆی کافر بوونتانەوە.

(١٠٧) بەڵام ئەوانەی رووخساریان سپی و گەش و جوانە لەناو رەحمەت و میهرەبانی خوادا ژیان دەبەنە سەر بۆ هەمیشە و بۆ هەتا هەتایی.

(١٠٨) ئەوانە ئایەتەکانی خوای گەورەن کە بەڕاست و دروستی بەسەرتا دەیخوێنینەوە ئەی محمد ﷺ ، خوایش هیچ ستەمی ناوێت و لای پەسەند نیە (لە دروست کراوانی و) لە هیچ خەڵکێکْ بکرێت.

وَلِلَّهِ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلْأَرْضِ ۚ وَإِلَى ٱللَّهِ تُرْجَعُ ٱلْأُمُورُ ﴿١٠٩﴾ كُنتُمْ خَيْرَ أُمَّةٍ أُخْرِجَتْ لِلنَّاسِ تَأْمُرُونَ بِٱلْمَعْرُوفِ وَتَنْهَوْنَ عَنِ ٱلْمُنكَرِ وَتُؤْمِنُونَ بِٱللَّهِ ۗ وَلَوْ ءَامَنَ أَهْلُ ٱلْكِتَٰبِ لَكَانَ خَيْرًا لَّهُم ۚ مِّنْهُمُ ٱلْمُؤْمِنُونَ وَأَكْثَرُهُمُ ٱلْفَٰسِقُونَ ﴿١١٠﴾ لَن يَضُرُّوكُمْ إِلَّآ أَذًى ۖ وَإِن يُقَٰتِلُوكُمْ يُوَلُّوكُمُ ٱلْأَدْبَارَ ثُمَّ لَا يُنصَرُونَ ﴿١١١﴾ ضُرِبَتْ عَلَيْهِمُ ٱلذِّلَّةُ أَيْنَ مَا ثُقِفُوٓا۟ إِلَّا بِحَبْلٍ مِّنَ ٱللَّهِ وَحَبْلٍ مِّنَ ٱلنَّاسِ وَبَآءُو بِغَضَبٍ مِّنَ ٱللَّهِ وَضُرِبَتْ عَلَيْهِمُ ٱلْمَسْكَنَةُ ۚ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ كَانُوا۟ يَكْفُرُونَ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ وَيَقْتُلُونَ ٱلْأَنۢبِيَآءَ بِغَيْرِ حَقٍّ ۚ ذَٰلِكَ بِمَا عَصَوا۟ وَّكَانُوا۟ يَعْتَدُونَ ﴿١١٢﴾ ۞ لَيْسُوا۟ سَوَآءً ۗ مِّنْ أَهْلِ ٱلْكِتَٰبِ أُمَّةٌ قَآئِمَةٌ يَتْلُونَ ءَايَٰتِ ٱللَّهِ ءَانَآءَ ٱلَّيْلِ وَهُمْ يَسْجُدُونَ ﴿١١٣﴾ يُؤْمِنُونَ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْءَاخِرِ وَيَأْمُرُونَ بِٱلْمَعْرُوفِ وَيَنْهَوْنَ عَنِ ٱلْمُنكَرِ وَيُسَٰرِعُونَ فِي ٱلْخَيْرَٰتِ وَأُو۟لَٰٓئِكَ مِنَ ٱلصَّٰلِحِينَ ﴿١١٤﴾ وَمَا يَفْعَلُوا۟ مِنْ خَيْرٍ فَلَن يُكْفَرُوهُ ۗ وَٱللَّهُ عَلِيمٌۢ بِٱلْمُتَّقِينَ ﴿١١٥﴾



(١٠٩) هەرچی لە ئاسمانەکان و هەرچی لە زەویدا هەیە، هەر خوا خاوەنیانە و گەڕانەوەی هەموو شتێک هەر بۆ لای خوایە.

(١١٠) (بەراستی) ئێوە چاکترین ئوممەتێکن کە (بۆ سوودی) خەڵکی هێنراونەتە مەیدانەوە، چونکە فەرمان بەچاکە دەدەن و قەدەغەی خراپە دەکەن و باوەڕی دامەزراوتان بەخوا دەهێنن، خۆ ئەگەر خاوەنانی کتێب باوەڕیان بهێنایە (بە ئاینی ئیسلام) ئەوە چاکتر بوو بۆیان هەیانە ئیماندارن، بەڵام زۆربەیان گوناهبارو تاوانکارن.

(١١١) هەرگیز ناتوانن زیان (لە بیرو باوەڕتان) بدەن مەگەر ئازارێکی کەم و ئەگەر بجەنگن دژتان پشتتان لێهەڵدەکەن و هەڵدێن، لەوەودواش سەرکەوتوو نابن.

(١١٢) (جوولەکە) زەلیلیی و ریسواییان بۆ بڕیاردراوە لە هەر کوێ جێگیر بن مەگەر لە سایەی ئاینی خوادا بحەوێنەوە و (زوڵمیان لێنەکرێت کاتێک ئیسلام فەرمانڕەوا بێت) یان بەخۆ هەڵواسین بەخەڵکیدا بۆ یارمەتیدانیان، یان پشتگرتنیان (لەو سەردەمانەدا کە ئیسلام فەرمانڕەوا بووە بەئاسوودەیی ژیاون، هەرچەند لە ژێرەوە هەر خەریکی پیلانگێڕان بوون، لە سەدەی بیستەمیشدا توانییان ئەمەریکاو ولاتانی رۆژئاواو هەندێ ولاتی تریش، بکەنە پشتیوان و داردەستی خۆیان). ئەوانە شایستەی خەشم و قینی خوا بوون و زەلیلی و خەجاڵەتی بەشیانە، چونکە ئەوانە بڕوایان نیە بەئایەتەکانی خواو پێغەمبەرانیش بە ناحەق دەکوژن، ئەم یاخی بوون و سەرشۆڕییەیان، بەهۆی سەرپێچی وگوناهباریانەوەیە، ئەوانە هەمیشە لە سنوور دەردەچوون و دەردەچن.

(١١٣) (گاور و جوو) هەموویان یەکسان و چوونیەک نین، بەڵکو لە خاوەنانی کتێب دەستەیەک لە ئیماندارانیان هەن، ئایەتەکانی خوا لەکاتەکانی شەودا دەخوێننەوەو نوێژدەکەن و سوژدە دەبەن (موسڵمانن بەهەموو واتایەک).

(١١٤) ئەوانە ئیمان و باوەڕیان بەخواو بە رۆژی دوایی هەیە و فەرمان دەدەن بە چاکە و قەدەغەی خراپە دەکەن و بە پەلە و تاڵوکەن بۆ ئەنجامدانی هەموو خێرو چاکەیەک، بێگومان ئەوانە لە ریزی چاکەکار و چاکەخوازاندان.

(١١٥) (ئەو ئیماندارانە) هەر چاکەیەک ئەنجام بدەن بەفیڕۆ ناچێت، خوایش زانایە بە پارێزکارو دینداران.

إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ لَن تُغْنِىَ عَنْهُمْ أَمْوَٰلُهُمْ وَلَآ أَوْلَٰدُهُم مِّنَ ٱللَّهِ شَيْـًٔا ۖ وَأُو۟لَٰٓئِكَ أَصْحَٰبُ ٱلنَّارِ ۚ هُمْ فِيهَا خَٰلِدُونَ ﴿١١٦﴾ مَثَلُ مَا يُنفِقُونَ فِى هَٰذِهِ ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا كَمَثَلِ رِيحٍ فِيهَا صِرٌّ أَصَابَتْ حَرْثَ قَوْمٍ ظَلَمُوٓا۟ أَنفُسَهُمْ فَأَهْلَكَتْهُ ۚ وَمَا ظَلَمَهُمُ ٱللَّهُ وَلَٰكِنْ أَنفُسَهُمْ يَظْلِمُونَ ﴿١١٧﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَا تَتَّخِذُوا۟ بِطَانَةً مِّن دُونِكُمْ لَا يَأْلُونَكُمْ خَبَالًا وَدُّوا۟ مَا عَنِتُّمْ قَدْ بَدَتِ ٱلْبَغْضَآءُ مِنْ أَفْوَٰهِهِمْ وَمَا تُخْفِى صُدُورُهُمْ أَكْبَرُ ۚ قَدْ بَيَّنَّا لَكُمُ ٱلْءَايَٰتِ ۖ إِن كُنتُمْ تَعْقِلُونَ ﴿١١٨﴾ هَٰٓأَنتُمْ أُو۟لَآءِ تُحِبُّونَهُمْ وَلَا يُحِبُّونَكُمْ وَتُؤْمِنُونَ بِٱلْكِتَٰبِ كُلِّهِۦ وَإِذَا لَقُوكُمْ قَالُوٓا۟ ءَامَنَّا وَإِذَا خَلَوْا۟ عَضُّوا۟ عَلَيْكُمُ ٱلْأَنَامِلَ مِنَ ٱلْغَيْظِ ۚ قُلْ مُوتُوا۟ بِغَيْظِكُمْ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمٌۢ بِذَاتِ ٱلصُّدُورِ ﴿١١٩﴾ إِن تَمْسَسْكُمْ حَسَنَةٌ تَسُؤْهُمْ وَإِن تُصِبْكُمْ سَيِّئَةٌ يَفْرَحُوا۟ بِهَا ۖ وَإِن تَصْبِرُوا۟ وَتَتَّقُوا۟ لَا يَضُرُّكُمْ كَيْدُهُمْ شَيْـًٔا ۗ إِنَّ ٱللَّهَ بِمَا يَعْمَلُونَ مُحِيطٌ ﴿١٢٠﴾ وَإِذْ غَدَوْتَ مِنْ أَهْلِكَ تُبَوِّئُ ٱلْمُؤْمِنِينَ مَقَٰعِدَ لِلْقِتَالِ ۗ وَٱللَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ ﴿١٢١﴾

(١١٦) بەڕاستی ئەوانەی کافرن هەرگیز ماڵ و منداڵیان فریایان ناکەوێت و لە دەست خەشم و قینی خوا رزگاریان نابێت، ئەوان نیشتەجێی ناو دۆزەخن و تیایدا ژیانی هەمیشەیی دەبەنەسەر.

(١١٧) نمونەی (ئەو ماڵ و داراییەی کە) دەیبەخشن لەم ژیانی دنیایەدا وەک رەشەبایەکی زۆر سارد وایە بدات بەسەر کێڵگەی کەسانێکدا کە ستەمیان لە خۆیان کردبێت (بەهۆی گوناهو تاوانەوە)، هەمووی تیا بەرێت، جا وەنەبێت خوا ستەمی لێکردبن بەڵکو هەر خۆیان ستەمیان لە خۆیان کردووە.

(١١٨) ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە، بە کەسانێکی تر جگە لە خۆتان متمانە مەکەن و نهێنی خۆتان لایان مەدرکێنن، چونکە ئەوان کۆڵنادەن لە دروستکردنی تەنگانەو گێروگرفت و ناخۆشی بۆتان، ئاواتیان ئەوەیە دووچاری ئازارو کێشە ببن، بەئاشکرا رق وکینە لە دەم و دویاندا دیارە، ئەوەی لە سینەیاندا شاردویانەتەوە زۆر گەورەترە لەوەی کە دەریدەخەن، بێگومان ئێمە نیشانەو بەڵگەمان بۆ دیاری کردوون (تا دۆست لە دوژمن جیابکەنەوە)، ئەگەر عەقڵ و ژیریتان بخەنەکار.

(١١٩) ئاگاداربن! ئێوە ئەوانتان خۆش دەوێت، بەڵام ئەوان ئێوەیان خۆش ناوێت و باوەڕتان بەهەموو کتێبە ئاسمانیەکانیش هەیە (بەڵام ئەوان باوەڕیان بە محمد ﷺ و بە قورئان نیە)، کاتێکیش پێتان دەگەن دەڵێن: ئێمە ئیمانداریـن بەڵام کاتێک بە تەنها دەبن، پەنجەی خۆیان دەگەزن ئەوەندە رق ئەستوور و داخ لە دڵن، پێیان بڵێ: دەک بمرن لە داخا، بەڕاستی خوا خۆی زانایە بەوەی کە لە دڵ و دەروون و سینەکاندا حەشاردراوە و (چاکتان دەناسێت).

(١٢٠) ئەگەر چاکەیەکتان تووش بوو، یان خێرێک رووی تێکردن، ئەوان پێی غەمبار دەبن و پێیان ناخۆشە، خۆ ئەگەر بەڵاو ناخۆشییەکتان بۆ پێش بێت، ئەوان پێی دڵخۆش دەبن، جا ئەگەر خۆگر بن و پارێزکار بن، پیلان و تەڵەکەی ئەوانە هیچ زیانێکتان پێناگەیەنێت، چونکە بەڕاستی خوا دەوری پیلان و پلانیانی داوەو ئاگایە بە هەموو کارو کردەوەو نەخشەیەکیان.

(١٢١) (لێرەوە قورئان لە غەزای ئوحود دەدوێت: یادی ئیمانداران بخەرەوە) کاتێک بەیانی زوو لە ماڵ دەرچوویت، شوێنی جەنگت بۆ ئیمانداران دیاری کرد (تیر ئەندازانی لەسەر گردەکە دامەزراندو فەرمووی پێیان: ئێمە سەرکەوتوو بووین، یان شکستمان هێنا، ئێوە شوێنی خۆتان بەجێ مەهێڵن) و شوێنی تریشی بۆ ئەوانی تر دیاری کرد، خوای گەورەش بیسەرە (بەگوفتارتان) زانایە (بە بیرو بۆچوونتان)...

إِذْ هَمَّت طَّآئِفَتَانِ مِنكُمْ أَن تَفْشَلَا وَٱللَّهُ وَلِيُّهُمَا وَعَلَى ٱللَّهِ فَلْيَتَوَكَّلِ ٱلْمُؤْمِنُونَ ﴿١٢٢﴾ وَلَقَدْ نَصَرَكُمُ ٱللَّهُ بِبَدْرٍ وَأَنتُمْ أَذِلَّةٌ فَٱتَّقُوا ٱللَّهَ لَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ ﴿١٢٣﴾ إِذْ تَقُولُ لِلْمُؤْمِنِينَ أَلَن يَكْفِيَكُمْ أَن يُمِدَّكُمْ رَبُّكُم بِثَلَٰثَةِ ءَالَٰفٍ مِّنَ ٱلْمَلَٰٓئِكَةِ مُنزَلِينَ ﴿١٢٤﴾ بَلَىٰٓ إِن تَصْبِرُوا وَتَتَّقُوا وَيَأْتُوكُم مِّن فَوْرِهِمْ هَٰذَا يُمْدِدْكُمْ رَبُّكُم بِخَمْسَةِ ءَالَٰفٍ مِّنَ ٱلْمَلَٰٓئِكَةِ مُسَوِّمِينَ ﴿١٢٥﴾ وَمَا جَعَلَهُ ٱللَّهُ إِلَّا بُشْرَىٰ لَكُمْ وَلِتَطْمَئِنَّ قُلُوبُكُم بِهِۦ وَمَا ٱلنَّصْرُ إِلَّا مِنْ عِندِ ٱللَّهِ ٱلْعَزِيزِ ٱلْحَكِيمِ ﴿١٢٦﴾ لِيَقْطَعَ طَرَفًا مِّنَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓا أَوْ يَكْبِتَهُمْ فَيَنقَلِبُوا خَآئِبِينَ ﴿١٢٧﴾ لَيْسَ لَكَ مِنَ ٱلْأَمْرِ شَىْءٌ أَوْ يَتُوبَ عَلَيْهِمْ أَوْ يُعَذِّبَهُمْ فَإِنَّهُمْ ظَٰلِمُونَ ﴿١٢٨﴾ وَلِلَّهِ مَا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِى ٱلْأَرْضِ يَغْفِرُ لِمَن يَشَآءُ وَيُعَذِّبُ مَن يَشَآءُ وَٱللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿١٢٩﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا لَا تَأْكُلُوا ٱلرِّبَوٰٓا أَضْعَٰفًا مُّضَٰعَفَةً وَٱتَّقُوا ٱللَّهَ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ ﴿١٣٠﴾ وَٱتَّقُوا ٱلنَّارَ ٱلَّتِىٓ أُعِدَّتْ لِلْكَٰفِرِينَ ﴿١٣١﴾ وَأَطِيعُوا ٱللَّهَ وَٱلرَّسُولَ لَعَلَّكُمْ تُرْحَمُونَ ﴿١٣٢﴾

(١٢٢) ئەوسا خەریکبوو دوو دەستە لە ئێوە پەشیمان بنەوەو (لە نیوەی ڕێ بگەڕێنەوە)، بەلام خوا یارو یاوەریان بوو (دڵیانی دامەزراند لەسەر فەرمانبەرداری) دەبا ئیمانداران هەر پشت بە خوا ببەستن.

(١٢٣) بێگومان خوا لە غەزای بەدردا سەرکەوتوی کردن، هەرچەندە ئێوە (لە ژمارە و چەکدا) لاوازو کەم بوون، دەی کەواتە لە خوا بترسن، بۆ ئەوەی سوپاسگوزار بن.

(١٢٤) (یادیان بهێنە) کاتێک بە ئیماندارانت دەوت: ئایا ئەوەندە بەس نیە کە پەروەردگارتان بە سێ هەزار فریشتە کۆمەکتان بکات و دایانبەزێنێت؟!

(١٢٥) بەڵێ ئەگەر خۆڕاگر بن و پارێزکار بن هەر ئێستا دێن بۆ لاتان و پەروەرگارتان پێنج هەزار فریشتەی نیشانەدارتان بۆ رەوانە دەکات، بۆ ئەوەی کۆمەکیتان بکەن.

(١٢٦) جا ئەو (هاوکاری) فریشتانە لەلایەن خواوە تەنها مژدەیەک بوو بۆ ئێوە، تادڵەکانتان پێی دامەزراوتر بێت، ئەگینا سەرکەوتن تەنها لەلایەن خوای باڵادەست و داناوەیە هەر ئەو دەیبەخشێت.

(١٢٧) (ئەو یاریدەی فریشتانە) لەبەرئەوە بوو کە: لایەک لە هێزی کافرەکان دابڕێت، تا سەرکوت و نابووتیان بکات و ئەوسا بە نائومێدیی و خەجاڵەتییەوە بگەڕێنەوە.

(١٢٨) بێگومان تۆ هیچ شتێکت لە کاروباری بەندەکان بەدەست نیە (بەڵکو هەمووشت بەدەست خوا خۆیەتی) ئەگەر تەوبەو پەشیمانیان لێ وەربگرێت، یان سزاو ئازاریان بدات، (سەربەستە)، چونکە ئەوانە ستەمکارن.

(١٢٩) هەرچی لە ئاسمانەکان و زەویدا هەیە خوای گەورە خاوەنیانە، لە هەر کەس بیەوێت خۆش دەبێت و (چاو پۆشیی زۆرە)، هەرکەسیش (شایستەی سزابێت) سزای دەدات، خوای گەورەش لێخۆشبوو میهرەبانە.

(١٣٠) (ئەم ئایەتە تێهەڵکێشی باسی غەزای ئوحود کراوە بۆ ئەوەی بسەلمێت کە ئەم ئاینە هەموو چەمکەکانی ژیان دەگرێتەوە، بۆیە روو بەئیمانداران دەفەرموێت): ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە سوو بەچەند قات وچەند بەرامبەر مەخۆن (ئەمەش قۆناغێک بوو لە حەرامکردنی یەکجاریی)، لە خوا بترسن، بۆ ئەوەی سەرفراز بن.

(١٣١) (هەوڵبدەن) خۆتان بپارێزن لەو ئاگرەی کە ئامادە کراوە بۆ کافرو بێباوەڕان.

(١٣٢) گوێڕایەڵ و فەرمانبەرداری خواو پێغەمبەرەکەی بن بۆ ئەوەی رەحمتان پێ بکرێت.



۞ وَسَارِعُوٓاْ إِلَىٰ مَغۡفِرَةٖ مِّن رَّبِّكُمۡ وَجَنَّةٍ عَرۡضُهَا ٱلسَّمَٰوَٰتُ وَٱلۡأَرۡضُ أُعِدَّتۡ لِلۡمُتَّقِينَ ﴿١٣٣﴾ ٱلَّذِينَ يُنفِقُونَ فِي ٱلسَّرَّآءِ وَٱلضَّرَّآءِ وَٱلۡكَٰظِمِينَ ٱلۡغَيۡظَ وَٱلۡعَافِينَ عَنِ ٱلنَّاسِۗ وَٱللَّهُ يُحِبُّ ٱلۡمُحۡسِنِينَ ﴿١٣٤﴾ وَٱلَّذِينَ إِذَا فَعَلُواْ فَٰحِشَةً أَوۡ ظَلَمُوٓاْ أَنفُسَهُمۡ ذَكَرُواْ ٱللَّهَ فَٱسۡتَغۡفَرُواْ لِذُنُوبِهِمۡ وَمَن يَغۡفِرُ ٱلذُّنُوبَ إِلَّا ٱللَّهُ وَلَمۡ يُصِرُّواْ عَلَىٰ مَا فَعَلُواْ وَهُمۡ يَعۡلَمُونَ ﴿١٣٥﴾ أُوْلَٰٓئِكَ جَزَآؤُهُم مَّغۡفِرَةٞ مِّن رَّبِّهِمۡ وَجَنَّٰتٞ تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَاۚ وَنِعۡمَ أَجۡرُ ٱلۡعَٰمِلِينَ ﴿١٣٦﴾ قَدۡ خَلَتۡ مِن قَبۡلِكُمۡ سُنَنٞ فَسِيرُواْ فِي ٱلۡأَرۡضِ فَٱنظُرُواْ كَيۡفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلۡمُكَذِّبِينَ ﴿١٣٧﴾ هَٰذَا بَيَانٞ لِّلنَّاسِ وَهُدٗى وَمَوۡعِظَةٞ لِّلۡمُتَّقِينَ ﴿١٣٨﴾ وَلَا تَهِنُواْ وَلَا تَحۡزَنُواْ وَأَنتُمُ ٱلۡأَعۡلَوۡنَ إِن كُنتُم مُّؤۡمِنِينَ ﴿١٣٩﴾ إِن يَمۡسَسۡكُمۡ قَرۡحٞ فَقَدۡ مَسَّ ٱلۡقَوۡمَ قَرۡحٞ مِّثۡلُهُۥۚ وَتِلۡكَ ٱلۡأَيَّامُ نُدَاوِلُهَا بَيۡنَ ٱلنَّاسِ وَلِيَعۡلَمَ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَيَتَّخِذَ مِنكُمۡ شُهَدَآءَۗ وَٱللَّهُ لَا يُحِبُّ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿١٤٠﴾

(١٣٣) بەپەلە بن و پێشبڕکێ بکەن تا دەگەنە لێخۆشبوونی پەروەردگارتان و بەهەشتێک کە پانایيەکەی ئاسمانەکان و زەوی گرتۆتەوەو ئامادە کراوە بۆ پارێزکاران، (پێغەمبەریش ﷺ دەفەرموێت : مەنزڵگای هەندێ دەبینن وەکو چۆن ئەستێرەی گەش دەبینن لە دوورەوە، فەرموویانە ئەی پێغەمبەری خوا: رەنگە ئەوانە مەنزڵگای پێغەمبەران بن، فەرمویەتی: نەخێر، بەڵکو مەنزڵگای کەسانێکن کە باوەڕیان بە خواو پێغەمبەرەکەی هێناوە، جا لەم سەردەمانەی دوایدا زانراوە ئەستێرەی چەندە گەورە هەیە کە خۆر لەئاستیدا زۆر بچوکە چ جای زەوی!!)

(١٣٤) ئەوانەی لە خۆشی و ناخۆشیدا، لە هەرزانی و گرانیدا ماڵ و سامانیان دەبەخشن، رق و کینەی خۆیان دەخۆنەوەو خۆگرن، لە خەڵکی خۆش دەبن و لێبووردەن، خوای میهرەبانیش چاکەکارو چاکەخوازانی خۆش دەوێت.

(١٣٥) ئەوانەش کە تاوان یان گوناهێک ئەنجام دەدەن، یاخود ستەم لە خۆیان دەکەن (دوایی بە خۆیاندا دێنەوەو سزای) خوا دێتەوە یادیان، ئەوسا داوای لێخۆشبوون دەکەن، جا کێ هەیە کە لە گوناهان خۆش ببێت جگە لە خوا؟! هەروەها لەسەر گوناهو تاوانیان بەردەوام نابن، لە کاتێکدا دەزانن (ئەوە تاوانە).

(١٣٦) ئا ئەوانە پاداشتیان لێخۆشبوون و لێبووردنە لە لایەن پەروەردگاریانەوە لەگەڵ باخەکانی بەهەشتدا کە چەندان رووبار بەژێر درەخت و بە بەردەم کۆشکەکانیاندا دەڕوات و ژیانی هەمیشەیی تیایدا دەبەنەسەر، ئەم بەهرەیە پاداشتێکی زۆر چاکی کۆششکارانە (چونکە دوای تەوبەکەیان لە هەوڵ و کۆششی بەدەست هێنانی رەزامەندیی خوادا دەبن).

(١٣٧) بەڕاستی پێش ئێوە چەندان یاساو بەرنامە تێپەڕیوە (لەلایەن خواوە کە سەرئەنجام ئیماندارانی سەرخستووە و کافرانی لەناو بردووە) دە ئێوەش بە زەویدا بگەڕێن و تەماشا بکەن و ئینجا سەرنج بدەن و وردببنەوە: بزانن سەرئەنجامی ئەوانە چۆن بووە کە بەرنامەی پێغەمبەرانی خوایان بە درۆ زانیوە.

(١٣٨) ئا ئەمەی کە باسکرا بەیاننامەو روونکردنەوەیە بۆ خەڵکی بە گشتی و رێنمووبەخش و ئامۆژگاریشە بۆ پارێزکاران بە تايبەتی.

(١٣٩) (ئەی ئیمانداران) کۆڵ مەدەن و ساردمەبنەوە و خەفەت مەخۆن، چونکە هەر ئێوە سەربەرزو سەرفرازو سەرکەوتووترن ئەگەر ئیمانداری چاک و راست و دروست بن.

(١٤٠) ئەگەر زام و سەختی و ناخۆشیەک (لە جەنگی ئوحود)دا تووشی ئێوە هاتووە، ئەو خەڵکەش (لەجەنگی بەدردا) تووشی هەمان زام و سەختی و ناخۆشی هاتن، ئێمە ئەو رۆژگارانە دەستاو دەست پێ دەکەین لەناو خەڵکیدا (تا لە جیهانی واقعیشدا) ئەوانەی باوەڕیان هێناوە خوا دەریان بخات و هەندێکتان بکات بە شايەت و بە پلەی شەهیدی بگەن، بێگومان خوا ستەمکارانی خۆش ناوێت.

وَلِيُمَحِّصَ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَيَمۡحَقَ ٱلۡكَٰفِرِينَ ﴿١٤١﴾ أَمۡ حَسِبۡتُمۡ أَن تَدۡخُلُواْ ٱلۡجَنَّةَ وَلَمَّا يَعۡلَمِ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ جَٰهَدُواْ مِنكُمۡ وَيَعۡلَمَ ٱلصَّٰبِرِينَ ﴿١٤٢﴾ وَلَقَدۡ كُنتُمۡ تَمَنَّوۡنَ ٱلۡمَوۡتَ مِن قَبۡلِ أَن تَلۡقَوۡهُ فَقَدۡ رَأَيۡتُمُوهُ وَأَنتُمۡ تَنظُرُونَ ﴿١٤٣﴾ وَمَا مُحَمَّدٌ إِلَّا رَسُولٌ قَدۡ خَلَتۡ مِن قَبۡلِهِ ٱلرُّسُلُۚ أَفَإِيْن مَّاتَ أَوۡ قُتِلَ ٱنقَلَبۡتُمۡ عَلَىٰٓ أَعۡقَٰبِكُمۡۚ وَمَن يَنقَلِبۡ عَلَىٰ عَقِبَيۡهِ فَلَن يَضُرَّ ٱللَّهَ شَيۡـٔٗاۗ وَسَيَجۡزِي ٱللَّهُ ٱلشَّٰكِرِينَ ﴿١٤٤﴾ وَمَا كَانَ لِنَفۡسٍ أَن تَمُوتَ إِلَّا بِإِذۡنِ ٱللَّهِ كِتَٰبٗا مُّؤَجَّلٗاۗ وَمَن يُرِدۡ ثَوَابَ ٱلدُّنۡيَا نُؤۡتِهِۦ مِنۡهَا وَمَن يُرِدۡ ثَوَابَ ٱلۡأٓخِرَةِ نُؤۡتِهِۦ مِنۡهَاۚ وَسَنَجۡزِي ٱلشَّٰكِرِينَ ﴿١٤٥﴾ وَكَأَيِّن مِّن نَّبِيّٖ قَٰتَلَ مَعَهُۥ رِبِّيُّونَ كَثِيرٞ فَمَا وَهَنُواْ لِمَآ أَصَابَهُمۡ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ وَمَا ضَعُفُواْ وَمَا ٱسۡتَكَانُواْۗ وَٱللَّهُ يُحِبُّ ٱلصَّٰبِرِينَ ﴿١٤٦﴾ وَمَا كَانَ قَوۡلَهُمۡ إِلَّآ أَن قَالُواْ رَبَّنَا ٱغۡفِرۡ لَنَا ذُنُوبَنَا وَإِسۡرَافَنَا فِيٓ أَمۡرِنَا وَثَبِّتۡ أَقۡدَامَنَا وَٱنصُرۡنَا عَلَى ٱلۡقَوۡمِ ٱلۡكَٰفِرِينَ ﴿١٤٧﴾ فَـَٔاتَىٰهُمُ ٱللَّهُ ثَوَابَ ٱلدُّنۡيَا وَحُسۡنَ ثَوَابِ ٱلۡأٓخِرَةِۗ وَٱللَّهُ يُحِبُّ ٱلۡمُحۡسِنِينَ ﴿١٤٨﴾

(١٤١) بێگومـان خـوای پـەروەردگار (تـاقی کردنەوە پێش دەهێنێت) تـا ئەوانـەی ئیمـاندارن پـاک و بێگـەردیان بکـات، کـافرانیش نـابووت و ریسوا بکات.

(١٤٢) یان واگومانتان دەبرد (هەروا بەئاسانی) دەچنە بەهەشتەوە؟! کە هێشتا خوا (لـە جیهانی واقعدا) دەریشی نەخستووە کامتـان هـەوڵ و کۆشش و جیهادی کـردووەو کامتـان خۆڕاگـرو ئارامگر بووە...

(١٤٣) لەڕاسـتیدا ئێـوە ئـاواتی مردنتـان دەخواست پێش ئەوەی پێی بگـەن (دەتـانوت: کەی جـەنگ دەبێت تـا شـەهید ببین) خۆ لـە ڕاستیدا مـەرگتان بـەچاوی خۆتـان بینی لـە کاتێکدا ئێوە چاوەڕوانی مەرگ بوون.

(١٤٤) (محمد ﷺ) تەنها پێغەمبەرێک نەبووە وەفـات بکـات، بێگومـان پێغەمبـەرانی پێـش ئەمیش (وەفاتیان کردووە)، ئایا ئەگـەر وەفـاتی کـرد یـان کـوژراو شـەهید بـوو، ئێـوە پاشـگەز دەبنەوە و هەڵدەگەڕێنەوە؟! (لەو دین و ئاینـەی کە پێی ڕاگەیاندوون) خۆ ئەوەی هەڵگەڕێتـەوە و پاشگـەزبێتـەوە، ئـەوە هـەرگیز زیـان بـەخـوا نـاگـەیـەنێت، لە داهاتویەکی نزیکدا خوای گەورە پاداشتی سوپاسگوزاران دەداتـەوە.

(١٤٥) هیچ کەسێکیش نامرێت مەگەر بەویستی خوا نـەبێت، لـە کـات و وەختـی دیـاری کـراودا (ئەمـەش هۆی هاندەرێکە بۆ ئیماندار کە لە مەرگ نەترسێت) جا ئەوەی پاداشـتی دنیـای دەوێـت هـەندێکی پێدەبەخشین، ئـەوەش پاداشتی قیامەتی دەوێت هەندێکی پێدەبەخشین، لە داهاتویەکی نزیکیشدا پاداشتی سوپاسگوزاران دەدەینەوە.

(١٤٦) چەندەها پێغەمبەر هەبوون کە خواناس و پیاوچاکـانی زۆر لەگـەڵیدا بـوون و دژ بـە دوژمنـان جـەنگاون، جا ئەوانە هیچ کات سستی و بێزاری و بێتاقەتی ڕووی تێنەکردوون بەهۆی ئەوەی کە تووشیان هـاتووە لـە پێنـاو ڕێبـازی خوادا، لاوازو بێ هێزو سەرشۆڕیش نەبوون بۆ دوژمنان، خوای گەورەش ئەو ئارامگرو خۆڕاگرانەی خۆشدەوێت.

(١٤٧) ئەوکاتە گوفتاریان تەنها ئەمە بووە کە وتویانە: پەروەردگارا لە گونـاهو هەڵـەکانمان ببـورەو لـە زیادەڕەوی کاروبارمان خۆش ببە، دامەزراومان بکە، سەرمان بخە بەسەر ئەم گەلە بێباوەڕەدا.

(١٤٨) ئەوسا ئیتر خوا پاداشـتی دنیـای پێبەخشین (بەسـەرکەوتن و پایـەداریی) پاداشـتی چـاکی قیامـەتیشی بـۆ مسۆگەر کردن و خوا ئەو چاکەکارانەی خۆش دەوێت.

يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِن تُطِيعُواْ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ يَرُدُّوكُمْ عَلَىٰٓ أَعْقَـٰبِكُمْ فَتَنقَلِبُواْ خَـٰسِرِينَ ﴿١٤٩﴾ بَلِ ٱللَّهُ مَوْلَىٰكُمْ ۖ وَهُوَ خَيْرُ ٱلنَّـٰصِرِينَ ﴿١٥٠﴾ سَنُلْقِى فِى قُلُوبِ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ ٱلرُّعْبَ بِمَآ أَشْرَكُواْ بِٱللَّهِ مَا لَمْ يُنَزِّلْ بِهِۦ سُلْطَـٰنًا ۖ وَمَأْوَىٰهُمُ ٱلنَّارُ ۚ وَبِئْسَ مَثْوَى ٱلظَّـٰلِمِينَ ﴿١٥١﴾ وَلَقَدْ صَدَقَكُمُ ٱللَّهُ وَعْدَهُۥٓ إِذْ تَحُسُّونَهُم بِإِذْنِهِۦ ۖ حَتَّىٰٓ إِذَا فَشِلْتُمْ وَتَنَـٰزَعْتُمْ فِى ٱلْأَمْرِ وَعَصَيْتُم مِّنۢ بَعْدِ مَآ أَرَىٰكُم مَّا تُحِبُّونَ ۚ مِنكُم مَّن يُرِيدُ ٱلدُّنْيَا وَمِنكُم مَّن يُرِيدُ ٱلْـَٔاخِرَةَ ۚ ثُمَّ صَرَفَكُمْ عَنْهُمْ لِيَبْتَلِيَكُمْ ۖ وَلَقَدْ عَفَا عَنكُمْ ۗ وَٱللَّهُ ذُو فَضْلٍ عَلَى ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴿١٥٢﴾ ۞ إِذْ تُصْعِدُونَ وَلَا تَلْوُۥنَ عَلَىٰٓ أَحَدٍ وَٱلرَّسُولُ يَدْعُوكُمْ فِىٓ أُخْرَىٰكُمْ فَأَثَـٰبَكُمْ غَمًّۢا بِغَمٍّ لِّكَيْلَا تَحْزَنُواْ عَلَىٰ مَا فَاتَكُمْ وَلَا مَآ أَصَـٰبَكُمْ ۗ وَٱللَّهُ خَبِيرٌۢ بِمَا تَعْمَلُونَ ﴿١٥٣﴾



(١٤٩) ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە ئەگەر ملکەچ و گوێڕایەڵی ئەوانە بن کە کافر و بێ دینن، ئەوە بەرەودوا دەتانگێڕنەوە و پاشگەزتان دەکەنەوە و لە دین وەرتاندەگێڕن، ئەوسا ئیتر بە دۆڕاوی دەگەڕێنەوە.

(١٥٠) (دڵنیابن کە خوانەناسان یارو یاوەری ئێوە نین) بەڵکو خوا یارو یاوەرتانە، بێگومان ئەو زاتە چاکترین پشتیوان و یاریدەدەرتانە.

(١٥١) (ئەی گرۆی ئیمانداران دڵنیابن) کە لەمەودوا ئێمە: ترس و بیم فڕێ دەدەینە دڵی ئەوانەی کە بێباوەڕن، بەهۆی ئەوەی شەریک و هاوەڵیان بۆ خوا بڕیارداوە بێ ئەوەی خوا هیچ دەسەڵاتێکی پێدابن (بۆ دانانی هاوەڵگەری)، ئەوانە سەرەنجامی گەڕانەوەیان ئاگری دۆزەخە کە چەند ناخۆش و خراپە جێگەی ستەمکاران.

(١٥٢) سوێند بێت، خوا بەڵێنی خۆی بۆ ئێوە بەڕاستی بردەسەر (لەسەرەتای جەنگی ئوحود)دا، هەر بەمۆڵەت و یارمەتی ئەو،(دوژمنانتان) بەگیر هێناو تێکتان شکاندن، هەتا ئەوکاتەی کە ساردیی رووی تێکردن و بوو بە کێشەتان لەسەر هەندێک شت و یاخی بوون (لە فەرمانی پێغەمبەر ﷺ سەنگەرتان چۆڵ کرد) دوای ئەوەی هەندێک شتی نیشاندان کە حەزتان لێدەکرد، هەتانە دنیای دەوێت و هەتانە قیامەتی مەبەستە، لەوەودوا دەستی ئێوەی کۆتاکرد (لە دوژمنان) تا تاقیتان بکاتەوە، سوێند بێت، بەڕاستی خوا چاوپۆشی لێکردن و لێتان خۆشبوو و خوا فەزڵ و رێزی هەیە بۆ ئیمانداران.

(١٥٣) ئیتر ئەوەبوو کە (بەگیرهاتن و کشانەوە و شپرزە و پەرت و بڵاوبوون) خۆتان هەڵدەگێرا بەکێوی ئوحود و دەورو بەریداو ئاوڕتان لە کەس نەدەدایەوە، لەکاتێکدا پێغەمبەریش بەدواتاندا بانگی دەکردن لە لاکەی ترەوە: (ئەی بەندەکانی خوا بگەڕێنەوە و رامەکەن)، جا ئەوەبوو ئێوە خەم وخەفەتتان کردە دڵی پێغەمبەرەوە (بە نافەرمانیتان خوای گەورەش) خەم و پەژارەی کردە دڵی ئێوەوە (بەدەنگو باسی بریندار بوونی پێغەمبەرو شەهید بوونی) تاوەکو خەفەت نەخۆن بۆ ئەوەی لە دەستتان چووە و ئەوەش کە خوا تووشی کردوون و بەسەری هێنان (دیارە هاوەڵان پێغەمبەریان لەخۆیان و لەهەموو شت لاخۆشەویستتر بووە) خواش ئاگادارە لەو کاروکردەوانەی کە ئەنجامی دەدەن.

ثُمَّ أَنزَلَ عَلَيْكُم مِّنۢ بَعْدِ ٱلْغَمِّ أَمَنَةً نُّعَاسًا يَغْشَىٰ طَآئِفَةً مِّنكُمْ ۖ وَطَآئِفَةٌ قَدْ أَهَمَّتْهُمْ أَنفُسُهُمْ يَظُنُّونَ بِٱللَّهِ غَيْرَ ٱلْحَقِّ ظَنَّ ٱلْجَٰهِلِيَّةِ ۖ يَقُولُونَ هَل لَّنَا مِنَ ٱلْأَمْرِ مِن شَىْءٍ ۗ قُلْ إِنَّ ٱلْأَمْرَ كُلَّهُۥ لِلَّهِ ۗ يُخْفُونَ فِىٓ أَنفُسِهِم مَّا لَا يُبْدُونَ لَكَ ۖ يَقُولُونَ لَوْ كَانَ لَنَا مِنَ ٱلْأَمْرِ شَىْءٌ مَّا قُتِلْنَا هَٰهُنَا ۗ قُل لَّوْ كُنتُمْ فِى بُيُوتِكُمْ لَبَرَزَ ٱلَّذِينَ كُتِبَ عَلَيْهِمُ ٱلْقَتْلُ إِلَىٰ مَضَاجِعِهِمْ ۖ وَلِيَبْتَلِىَ ٱللَّهُ مَا فِى صُدُورِكُمْ وَلِيُمَحِّصَ مَا فِى قُلُوبِكُمْ ۗ وَٱللَّهُ عَلِيمٌۢ بِذَاتِ ٱلصُّدُورِ ﴿١٥٤﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ تَوَلَّوْا۟ مِنكُمْ يَوْمَ ٱلْتَقَى ٱلْجَمْعَانِ إِنَّمَا ٱسْتَزَلَّهُمُ ٱلشَّيْطَٰنُ بِبَعْضِ مَا كَسَبُوا۟ ۖ وَلَقَدْ عَفَا ٱللَّهُ عَنْهُمْ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ حَلِيمٌ ﴿١٥٥﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَا تَكُونُوا۟ كَٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ وَقَالُوا۟ لِإِخْوَٰنِهِمْ إِذَا ضَرَبُوا۟ فِى ٱلْأَرْضِ أَوْ كَانُوا۟ غُزًّى لَّوْ كَانُوا۟ عِندَنَا مَا مَاتُوا۟ وَمَا قُتِلُوا۟ لِيَجْعَلَ ٱللَّهُ ذَٰلِكَ حَسْرَةً فِى قُلُوبِهِمْ ۗ وَٱللَّهُ يُحْىِۦ وَيُمِيتُ ۗ وَٱللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ ﴿١٥٦﴾ وَلَئِن قُتِلْتُمْ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ أَوْ مُتُّمْ لَمَغْفِرَةٌ مِّنَ ٱللَّهِ وَرَحْمَةٌ خَيْرٌ مِّمَّا يَجْمَعُونَ ﴿١٥٧﴾

(١٥٤) پاشـان، دوای ئـەو غـەم و پەژارەیـە ئـارامیی و هێمنیـی بەسـەردا دابـەزاندن کـە وەنـەوزێک بـوو دەسـتەیەکتانی داگرتبـوو، دەستەیەکی تریش بەڕاستی خـەمی خۆیـان بـوو، گومـانی نارەوایـان دەبرد بـەخوای گـەورە بـە گومـانی نەفامانـە، دەیـانوت: ئایا ئێمـە لـەم کـارەدا (لـە بەدەستهێنانی سـەرکەوتن) هیـچ شتێکمان هەیە؟! (ئەوپشتیوانەی کەخوا بەڵێنی پێدابووین بـۆ نـەهات؟!) ئـەی محمد ﷺ پێیـان بڵێ: بێگومان هـەمرو شـتێک بەدەست خوایـە، ئەوانـە هـەندێک شت دەشارنەوە لـە دەروونـی خۆیاندا و بۆ تـۆی دەرناخـەن، هـەروەها دەڵێـن: ئەگـەر (بـەڵێنی سـەرکەوتن راست بوایـە) ئێمـە شتێکمان بەدەست بوایە ئالێرەدا نەدەکوژراین!! پێیان بڵێ: ئەگەر لەماڵی خۆشـتاندا بوونایـە، ئەوانەی کە بڕیـارە بکوژرانایـە، دەبـوا هـەروایاز بەسەر بهاتایەو لە شوێنی کوژرانیاندا راکشـانایە بێگومان خوا ئەم شتانەتان بەسـەر دەهێنێت تـا ئەوەی لە دەروونتاندا هەیە تاقی بکاتەوە و چـی لەدڵەکانتاندا هەیە خاوێنی بکاتەوە و حەقیقەتی دەربخات، ئـەو خوایـەش زانایـە بـەوەی کـە لـە ناخی سینەکاندا حەشار دراوە.

(١٥٥) بێگومان ئەوانەی پشتیان هەڵکرد (لە غەزای ئوحود) لـە رۆژی بەیەکگەیشتنی هـەردوو ئـۆردوو (ئـۆردووی ئیمانداران و ئۆردووی بێباوەڕان)، ئەوانـە تەنـها شـەیتان تووشـی هەڵـەی کـردن لـە خشـتـەی بـردن بـەهۆی هـەندێک گوناهەوە کە ئەنجامیان دابوو، بەڕاستی خوا لێیان خۆشبوو چونکە بێگومان خـوا لێخۆشـبووە (لـە گوناهەکـەتان) و ئارامگرو خۆڕاگرە (زوو تۆڵە لە یاخی بوان ناسێنێت).

(١٥٦) ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە وەکو ئەوانە مەبن کە بێـباوەڕ بـوون، لـەکاتی سـەفەر بەسـەر زەویدا، یـاخود کاتی جەنگ، بەبرایانی (هاوبیریان) دەوت: ئەگەر لای ئێمە بوونایە نە دەمردن، نە دەکوژران!! بـۆ ئـەوەی خـوا ئـەو بکاتە خەفەت و ناخۆشی لە دڵیاندا، خۆ هەر خـوا ژیـان بەخشـە و مرێنـەرە، خـوا بینایـە بـەو کـارو کردەوانـەی کـە ئەنجامی دەدەن.

(١٥٧) خۆ ئەگەر بکوژرێن لە پێناوی خوادا یاخود بمـرن، لێخـۆش بـوون لەلایـەن خـواوە هـاوڕێ لەگـەڵ رەحمـەت چاکترە لەوەی کە خەڵکی کۆی دەکەنەوە.

وَلَئِن مُّتُّمْ أَوْ قُتِلْتُمْ لَإِلَى ٱللَّهِ تُحْشَرُونَ ﴿١٥٨﴾ فَبِمَا رَحْمَةٍ مِّنَ ٱللَّهِ لِنتَ لَهُمْ وَلَوْ كُنتَ فَظًّا غَلِيظَ ٱلْقَلْبِ لَٱنفَضُّوا۟ مِنْ حَوْلِكَ فَٱعْفُ عَنْهُمْ وَٱسْتَغْفِرْ لَهُمْ وَشَاوِرْهُمْ فِى ٱلْأَمْرِ فَإِذَا عَزَمْتَ فَتَوَكَّلْ عَلَى ٱللَّهِ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلْمُتَوَكِّلِينَ ﴿١٥٩﴾ إِن يَنصُرْكُمُ ٱللَّهُ فَلَا غَالِبَ لَكُمْ وَإِن يَخْذُلْكُمْ فَمَن ذَا ٱلَّذِى يَنصُرُكُم مِّنۢ بَعْدِهِۦ وَعَلَى ٱللَّهِ فَلْيَتَوَكَّلِ ٱلْمُؤْمِنُونَ ﴿١٦٠﴾ وَمَا كَانَ لِنَبِىٍّ أَن يَغُلَّ وَمَن يَغْلُلْ يَأْتِ بِمَا غَلَّ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ ثُمَّ تُوَفَّىٰ كُلُّ نَفْسٍ مَّا كَسَبَتْ وَهُمْ لَا يُظْلَمُونَ ﴿١٦١﴾ أَفَمَنِ ٱتَّبَعَ رِضْوَٰنَ ٱللَّهِ كَمَنۢ بَآءَ بِسَخَطٍ مِّنَ ٱللَّهِ وَمَأْوَىٰهُ جَهَنَّمُ وَبِئْسَ ٱلْمَصِيرُ ﴿١٦٢﴾ هُمْ دَرَجَٰتٌ عِندَ ٱللَّهِ وَٱللَّهُ بَصِيرٌۢ بِمَا يَعْمَلُونَ ﴿١٦٣﴾ لَقَدْ مَنَّ ٱللَّهُ عَلَى ٱلْمُؤْمِنِينَ إِذْ بَعَثَ فِيهِمْ رَسُولًا مِّنْ أَنفُسِهِمْ يَتْلُوا۟ عَلَيْهِمْ ءَايَٰتِهِۦ وَيُزَكِّيهِمْ وَيُعَلِّمُهُمُ ٱلْكِتَٰبَ وَٱلْحِكْمَةَ وَإِن كَانُوا۟ مِن قَبْلُ لَفِى ضَلَٰلٍ مُّبِينٍ ﴿١٦٤﴾ أَوَلَمَّآ أَصَٰبَتْكُم مُّصِيبَةٌ قَدْ أَصَبْتُم مِّثْلَيْهَا قُلْتُمْ أَنَّىٰ هَٰذَا قُلْ هُوَ مِنْ عِندِ أَنفُسِكُمْ إِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ ﴿١٦٥﴾

(١٥٨) سوێند بێت ئەگەر بمرن یان بکوژرێن هەر بۆ لای خوا کۆ دەکرێنەوە.

(١٥٩) کەوابوو (ئەی محمد ﷺ بەهۆی ڕەحمەتی خواوەیە تۆ نەرم و هێمن بویت لەگەڵیاندا، خۆ ئەگەر توڕەو قسە ڕەق و بێ بەزەیی بوویتایە، ئەوە هەموو لە دەورت بلاوەیان دەکرد، کەواتە چاوپۆشیان لێبکە و لێیان ببورەو داوای لێخۆش بوونیان بۆ بکە، لە کارو پێشهاتدا پرس و ڕایان پێبکە، (دوای مەشورەت و پرس و ڕا) ئەگەر بڕیارتدا (کارێک ئەنجام بدەیت، ئەنجامی بدەو) پشت بەخوا ببەستە، چونکە بەڕاستی خوا ئەوانەی خۆشدەوێت کە پشتی پێدەبەستن.

(١٦٠) ئەگەر خوا سەرکەوتنتان پێ ببەخشێت ئەوە هیچ کەس ناتوانێت سەرکەوێت بەسەرتاندا، خۆ ئەگەر پشتتان بەربدات، ئەوە کێ هەیە دوای ئەو کۆمەکتان بکات و سەرتان بخات، دە با ئەوانەی ئیماندارن هەر پشت بەخوا ببەستن.

(١٦١) (هەندێک گومانیان برد کە پێغەمبەر ﷺ لە دابەشکردنی دەسکەوتدا نادادیی دەکات) بێگومان بۆ هیچ پێغەمبەرێک نەبووە کە نادادی و خیانەت بکات، هەر کەس ناحەقی و نادادی بکات لە ڕۆژی قیامەتدا نادادیەکەی (بەخەی پێ دەگرێت و) بەکۆڵیەوەیەتی، لەوەودوا پاداشتی هەر کەسێک بەگوێرەی کردەوەکانی دەدرێتەوە و ئەوانە ستەمیان لێناکرێت.

(١٦٢) ئایا ئەو کەسەی (بە پەرستن و چاکەکاری) شوێنی ڕەزامەندیی خوا کەوتبێت، وەکو ئەو کەسە وایە (کە بەهۆی گوناهو تاوانەوە) شایستەی خەشم و قینی خوا بێت؟ بێگومان شوێنی ئەو جۆرە کەسانە دۆزەخە کە سەرەنجامێکی ناخۆشە.

(١٦٣) هەریەک لەو (دوو دەستەیە) پلەو پایەی خۆی هەیە لای خوا (لە بەهەشتی بەریندا یاخود لە ناخی دۆزەخدا)، بەڕاستی خوا بینایە بەو کارو کردەوانەی کە ئەنجامی دەدەن.

(١٦٤) سوێند بێت بێگومان خوا منەتی ناوەتە سەر ئیمانداران کاتێک پێغەمبەرێکی بۆ ڕەوانە کردوون لە خۆیان ئایەتەکانی ئەویان بەسەردا دەخوێنێتەوە، دڵ و دەروونیان پاک و پوخت دەکاتەوە، هەروەها فێری قورئان و دانایییان دەکات، بەڕاستی پێشتر لە گومڕاییەکی ئاشکرادا ڕۆچوو بوون.

(١٦٥) ئایا کاتێک بەڵاو ناخۆشیەکتان توشهات (لە جەنگی ئوحود) دا بۆ دەڵێن: ئەمە چی بوو؟ بۆ وامان بەسەر هات؟ لەکوێوە ئەمەمان بۆهات؟ (ئەی بۆ لەیادیان چوو، خۆ لەجەنگی بەدردا) بەڕاستی ئێوە دوونەوەندەتان بەوان کرد؟! ئینجا پێیان بڵێ: ئەو بەڵایە لەلایەن خۆتانەوە توشتان هات (کاتێک نافەرمانی پێغەمبەرتان کردو تەماعی دنیا لە دەروونتاندا جوولا) بەڕاستی خوا دەسەڵاتی بەسەر هەموو شتێکدا هەیە، (بەندە چاکەکانیشی کاتێک هەڵە بکەن تووشی بەڵایان دەکات)...

وَمَآ أَصَٰبَكُمۡ يَوۡمَ ٱلۡتَقَى ٱلۡجَمۡعَانِ فَبِإِذۡنِ ٱللَّهِ وَلِيَعۡلَمَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ ﴿١٦٦﴾ وَلِيَعۡلَمَ ٱلَّذِينَ نَافَقُواْۚ وَقِيلَ لَهُمۡ تَعَالَوۡاْ قَٰتِلُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ أَوِ ٱدۡفَعُواْۖ قَالُواْ لَوۡ نَعۡلَمُ قِتَالٗا لَّٱتَّبَعۡنَٰكُمۡۗ هُمۡ لِلۡكُفۡرِ يَوۡمَئِذٍ أَقۡرَبُ مِنۡهُمۡ لِلۡإِيمَٰنِۚ يَقُولُونَ بِأَفۡوَٰهِهِم مَّا لَيۡسَ فِي قُلُوبِهِمۡۚ وَٱللَّهُ أَعۡلَمُ بِمَا يَكۡتُمُونَ ﴿١٦٧﴾ ٱلَّذِينَ قَالُواْ لِإِخۡوَٰنِهِمۡ وَقَعَدُواْ لَوۡ أَطَاعُونَا مَا قُتِلُواْۗ قُلۡ فَٱدۡرَءُواْ عَنۡ أَنفُسِكُمُ ٱلۡمَوۡتَ إِن كُنتُمۡ صَٰدِقِينَ ﴿١٦٨﴾ وَلَا تَحۡسَبَنَّ ٱلَّذِينَ قُتِلُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ أَمۡوَٰتَۢاۚ بَلۡ أَحۡيَآءٌ عِندَ رَبِّهِمۡ يُرۡزَقُونَ ﴿١٦٩﴾ فَرِحِينَ بِمَآ ءَاتَىٰهُمُ ٱللَّهُ مِن فَضۡلِهِۦ وَيَسۡتَبۡشِرُونَ بِٱلَّذِينَ لَمۡ يَلۡحَقُواْ بِهِم مِّنۡ خَلۡفِهِمۡ أَلَّا خَوۡفٌ عَلَيۡهِمۡ وَلَا هُمۡ يَحۡزَنُونَ ﴿١٧٠﴾ ۞ يَسۡتَبۡشِرُونَ بِنِعۡمَةٖ مِّنَ ٱللَّهِ وَفَضۡلٖ وَأَنَّ ٱللَّهَ لَا يُضِيعُ أَجۡرَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ ﴿١٧١﴾ ٱلَّذِينَ ٱسۡتَجَابُواْ لِلَّهِ وَٱلرَّسُولِ مِنۢ بَعۡدِ مَآ أَصَابَهُمُ ٱلۡقَرۡحُۚ لِلَّذِينَ أَحۡسَنُواْ مِنۡهُمۡ وَٱتَّقَوۡاْ أَجۡرٌ عَظِيمٌ ﴿١٧٢﴾ ٱلَّذِينَ قَالَ لَهُمُ ٱلنَّاسُ إِنَّ ٱلنَّاسَ قَدۡ جَمَعُواْ لَكُمۡ فَٱخۡشَوۡهُمۡ فَزَادَهُمۡ إِيمَٰنٗا وَقَالُواْ حَسۡبُنَا ٱللَّهُ وَنِعۡمَ ٱلۡوَكِيلُ ﴿١٧٣﴾



(١٦٦) ئەوەش کە تووشتان بوو لە ڕۆژی بەیەک گەیشتنی هەردوو ئۆردووەکە (لە جەنگی ئوحود) دا ئەوە بە فرمان و ویستی خوا بوو، تا ئیمانی باوەڕداران دەربخات...

(١٦٧) دووڕوویی و نالەباریی دووڕووەکانیش دەربخات، کاتێک پێیان وترا: وەرن بجەنگن لە پێناوی خوادا، یان (هیچ نەبێت) بەرگری لە خۆتان و ماڵ و منداڵتان بکەن، وتیان: ئەگەر بمانزانیایە شەڕو جەنگ بەرپا دەبێت ئەوە شوێنتان دەکەوتین و دەجەنگاین، ئەوانە ئەو ڕۆژە لە کوفرەوە نزیکترن تا لە ئیمان، بەدەمیان شتێک دەڵێن کە لە دڵ و دەروونیاندا نییە، خوایش زانایە بەوەی کە دەیشارنەوە...

(١٦٨) ئەوانەی بۆی دانیشتن و (نەچوون بۆ جەنگ) بەبراکانی خۆیانیان وت: ئەگەر ئەوانە (واتە شەهیدان) بەقسەی ئێمەیان بکردایە نە دەکوژران، ئەی پێغەمبەر ﷺ پێیان بڵێ: دەی کەواتە مردن لە خۆتان دووربخەنەوە ئەگەر ڕاست دەکەن؟!

(١٦٩) هەرگیز وامەزانن و وادامەنێن ئەوانەی لەپێناوی خوادا شەهید بوون و کوژران، مردوون، نەخێر وانیە، بەڵکو ئەوانە زیندوون، لای پەروەردگاریان لە ڕزق و ڕۆزیی (هەمە جۆرو تایبەت) بەهرەوەرن.

(١٧٠) زۆر دڵخۆش و شادمانن بەو بەخشش و زیادە فەزڵەی کە خوا پێی بەخشیوون، مژدەش دەدەن بەوانەی هێشتا بەوان نەگەیشتوون و (شەهید نەبوون) کە بێگومان هیچ ترس و بیمێکیان لەسەر نییە، هیچ غەم و پەژارەیەکتان بۆ پێش نایەت (لە بەجێ هێشتنی دنیا).

(١٧١) مژدە دەدەن بەنازو نیعمەتانی تایبەتی و فەزڵ و ڕێزی بێ سنوور لەلایەن خوای میهرەبانەوە، بەڕاستی خوایش پاداشتی ئیمانداران زایە ناکات و (ڕەنج بەخەسار نابن)...

(١٧٢) ئەوانەی کە بەدەم بانگەوازی خواو پێغەمبەرەوە ﷺ چوون، دوای ئەوەی کە تووشی ناخۆشی و زام و ئێش بوون، بۆ ئەوانەیان کە چاکەیان کردو پارێزکار بوون، پاداشتی زۆر گەورە و بێ سنوور ئامادەیە...

(١٧٣) ئەوانەی کە خەڵکی (باوەڕ لاواز) پێیان دەڵێن: بەڕاستی خەڵکی بێ باوەڕو خوانەناس خۆیان بۆ ئێوە کۆ کردۆتەوە و خۆیان بۆ ئێوە مەڵاس داوە، لێیان بترسن (خۆتان تووشی بەڵا مەکەن) بەڵام ئەوان (واتە ئیمانداران بەو پڕوپاگەندەیە) باوەڕیان زیاتر دامەزراو، وتیان: خوامان بەسە کە یاریدەدەرو یارمەتیدەرێکی چاکە.

فَانقَلَبُوا بِنِعْمَةٍ مِّنَ اللَّهِ وَفَضْلٍ لَّمْ يَمْسَسْهُمْ سُوءٌ وَاتَّبَعُوا رِضْوَانَ اللَّهِ ۗ وَاللَّهُ ذُو فَضْلٍ عَظِيمٍ ﴿١٧٤﴾ إِنَّمَا ذَٰلِكُمُ الشَّيْطَانُ يُخَوِّفُ أَوْلِيَاءَهُ فَلَا تَخَافُوهُمْ وَخَافُونِ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ ﴿١٧٥﴾ وَلَا يَحْزُنكَ الَّذِينَ يُسَارِعُونَ فِي الْكُفْرِ ۚ إِنَّهُمْ لَن يَضُرُّوا اللَّهَ شَيْئًا ۗ يُرِيدُ اللَّهُ أَلَّا يَجْعَلَ لَهُمْ حَظًّا فِي الْآخِرَةِ ۖ وَلَهُمْ عَذَابٌ عَظِيمٌ ﴿١٧٦﴾ إِنَّ الَّذِينَ اشْتَرَوُا الْكُفْرَ بِالْإِيمَانِ لَن يَضُرُّوا اللَّهَ شَيْئًا وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿١٧٧﴾ وَلَا يَحْسَبَنَّ الَّذِينَ كَفَرُوا أَنَّمَا نُمْلِي لَهُمْ خَيْرٌ لِّأَنفُسِهِمْ ۚ إِنَّمَا نُمْلِي لَهُمْ لِيَزْدَادُوا إِثْمًا ۚ وَلَهُمْ عَذَابٌ مُّهِينٌ ﴿١٧٨﴾ مَّا كَانَ اللَّهُ لِيَذَرَ الْمُؤْمِنِينَ عَلَىٰ مَا أَنتُمْ عَلَيْهِ حَتَّىٰ يَمِيزَ الْخَبِيثَ مِنَ الطَّيِّبِ ۗ وَمَا كَانَ اللَّهُ لِيُطْلِعَكُمْ عَلَى الْغَيْبِ وَلَٰكِنَّ اللَّهَ يَجْتَبِي مِن رُّسُلِهِ مَن يَشَاءُ ۖ فَآمِنُوا بِاللَّهِ وَرُسُلِهِ ۚ وَإِن تُؤْمِنُوا وَتَتَّقُوا فَلَكُمْ أَجْرٌ عَظِيمٌ ﴿١٧٩﴾ وَلَا يَحْسَبَنَّ الَّذِينَ يَبْخَلُونَ بِمَا آتَاهُمُ اللَّهُ مِن فَضْلِهِ هُوَ خَيْرًا لَّهُم ۖ بَلْ هُوَ شَرٌّ لَّهُمْ ۖ سَيُطَوَّقُونَ مَا بَخِلُوا بِهِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ ۗ وَلِلَّهِ مِيرَاثُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ ۗ وَاللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرٌ ﴿١٨٠﴾

(١٧٤) ئەوسا ئیتر موسوڵمانان گەڕانەوە هاوڕێ لەگەڵ فەزڵ و نازو نیعمەتی خوایی‌دا، هیچ ناخۆشیەکیشیان بۆ پێش نەهات، چونکە شوێنی ڕەزامەندی خوا کەوتبوون و (هەر ئەوەشیان مەبەست بوو)، خوای گەورەش هەر خۆی خاوەنی فەزڵ و ڕێزێکی زۆر گەورەیە.

(١٧٥) ئەوە بەڕاستی تەنها شەیتانە یاوەرەکانی خۆی دەترسێنێت، ئێوەی (ئیماندار) لێیان مەترسن، بەڵکو هەر لە من بترسن ئەگەر ئیماندارن (بێگومان ترسان لە خوا ئاسودەیی و ئارامیی دەبەخشێت بە ئیماندار).

(١٧٦) (ئەی پێغەمبەر ﷺ) ئەوانەی کە پێشبرکێ دەکەن لە بێباوەڕیدا خەمبارت نەکەن، چونکە بەڕاستی ئەوانە هەرگیز هیچ زیانێک بەخوا ناگەیەنن، خوا دەیەوێت هیچ بەشێکیان لە قیامەتدا پێ نەبەخشێت، سزای سەخت و زۆر ناسۆریش بۆیان ئامادەیە.

(١٧٧) بەڕاستی ئەوانەی بێ باوەڕییان هەڵبژارد لە جیاتی ئیمان، بێ باوەڕییان کڕی لەجیاتی باوەڕ، بەهیچ جۆرێک زیان بەخوا ناگەیەنن بەڵکو سزای بەئێش چاوەڕێیانە.

(١٧٨) ئەوانەی ڕێبازی کوفریان گرتۆتەبەر، وا گومان نەبەن کە مۆڵەتمان داون و (نازو نیعمەتی دنیامان پێبەخشیوون) ئەوە خێرە بۆیان، ئێمە تەنها بۆیە مۆڵەتیان دەدەین تا زیاتر گوناهبار ببن و سزایەکی ریسواکەر چاوەڕێیانە.

(١٧٩) خوا ئیمانداران واز لێناهێنێت هەر وەکو ئەوەی کە ئێستا ئێوە لەسەری هەن (دڵسۆزو نادڵسۆز، خەمخۆرو بێ باک تێکەڵن)، هەتا پیس و پاک لەیەک جیانەکاتەوە (بەهۆی جۆرەها تاقی کردنەوە و پێشهاتەوە)، بێگومان خوا جیهانی شاراوەتان نیشان نادات (تا ئاینده بزانن)، بەڵکو خوا لە پێغەمبەرەکانی کەسانێک هەڵدەبژێرێت کە بیەوێت (تا لە هەندێک نهێنی ئاگاداربن بەو ڕادەیەی کە پێویستە)، جا باوەڕ بەخواو پێغەمبەرانی بهێنن، خۆ ئەگەر باوەڕی دامەزراو بهێنن و پارێزکاری بکەن و لە خوا ترس بن، ئەوە پاداشتی بێ سنوور و نەبڕاوە چاوەڕێتانە.

(١٨٠) واگومان نەبەن ئەوانەی کە بەخیلی و ڕەزیلی دەکەن، لەو نازو نیعمەتانەی خوا پێی بەخشیوون، نابەخشن، کارێکی چاکە بۆیان، نەخێر ئەوە کارێکی خراپ و نادروستە بۆیان، چونکە ئەو شتانەی کە نەیاندەبەخشی لە ڕۆژی قیامەتدا دەست دەنێتە بینیان و دەبنە کۆت لە گەردنیاندا، (بێگومان) هەرچی لە ئاسمانەکان و زەویدا هەیە هەر خوا خاوەنیانەو خوا ئاگایە بە هەموو ئەو کارو کردەوانەی کە ئێوە ئەنجامی دەدەن.

لَّقَدْ سَمِعَ ٱللَّهُ قَوْلَ ٱلَّذِينَ قَالُوٓا۟ إِنَّ ٱللَّهَ فَقِيرٌ وَنَحْنُ أَغْنِيَآءُ ۘ
سَنَكْتُبُ مَا قَالُوا۟ وَقَتْلَهُمُ ٱلْأَنۢبِيَآءَ بِغَيْرِ حَقٍّ وَنَقُولُ
ذُوقُوا۟ عَذَابَ ٱلْحَرِيقِ ﴿١٨١﴾ ذَٰلِكَ بِمَا قَدَّمَتْ أَيْدِيكُمْ
وَأَنَّ ٱللَّهَ لَيْسَ بِظَلَّامٍ لِّلْعَبِيدِ ﴿١٨٢﴾ ٱلَّذِينَ قَالُوٓا۟ إِنَّ
ٱللَّهَ عَهِدَ إِلَيْنَآ أَلَّا نُؤْمِنَ لِرَسُولٍ حَتَّىٰ يَأْتِيَنَا بِقُرْبَانٍ
تَأْكُلُهُ ٱلنَّارُ ۗ قُلْ قَدْ جَآءَكُمْ رُسُلٌ مِّن قَبْلِى بِٱلْبَيِّنَٰتِ
وَبِٱلَّذِى قُلْتُمْ فَلِمَ قَتَلْتُمُوهُمْ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ ﴿١٨٣﴾
فَإِن كَذَّبُوكَ فَقَدْ كُذِّبَ رُسُلٌ مِّن قَبْلِكَ جَآءُو بِٱلْبَيِّنَٰتِ
وَٱلزُّبُرِ وَٱلْكِتَٰبِ ٱلْمُنِيرِ ﴿١٨٤﴾ كُلُّ نَفْسٍ ذَآئِقَةُ ٱلْمَوْتِ ۗ
وَإِنَّمَا تُوَفَّوْنَ أُجُورَكُمْ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ ۖ فَمَن زُحْزِحَ
عَنِ ٱلنَّارِ وَأُدْخِلَ ٱلْجَنَّةَ فَقَدْ فَازَ ۗ وَمَا ٱلْحَيَوٰةُ ٱلدُّنْيَآ
إِلَّا مَتَٰعُ ٱلْغُرُورِ ﴿١٨٥﴾ ۞ لَتُبْلَوُنَّ فِىٓ أَمْوَٰلِكُمْ

وَأَنفُسِكُمْ وَلَتَسْمَعُنَّ مِنَ ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْكِتَٰبَ
مِن قَبْلِكُمْ وَمِنَ ٱلَّذِينَ أَشْرَكُوٓا۟ أَذًى كَثِيرًا ۚ
وَإِن تَصْبِرُوا۟ وَتَتَّقُوا۟ فَإِنَّ ذَٰلِكَ مِنْ عَزْمِ ٱلْأُمُورِ ﴿١٨٦﴾

(١٨١) سوێند بێت بێگومان خوای پەروەردگار گوفتاری (نابەجێی) ئەو (جولەکانەی) بیست کە وتیان: خوا هەژارە و ئێمە دەوڵەمەندین!! ئێمە ئەو گوفتارانە یاداشت و تۆمار دەکەین لەسەریان، هەروەها کوشتنی پێغەمبەران بە دەستی ئەوان بە ناحەق، (لە دۆزەخیشدا) پێیان دەڵێین: بچێژن سزای ئاگری سوتێنەر...

(١٨٢) ئەو سزایە لە دەرەنجامی دەستپێشخەری خۆتاندایە، چونکە بەڕاستی خوا هیچ جۆرە ستەمێک لە بەندەکان ناکات.

(١٨٣) (ئەو جوولەکانەی) دەڵێن: خوا پەیمانی داوە بە ئێمە کە بە هیچ پێغەمبەرێک باوەڕ نەکەین تاقوربانیەکمان بۆ نەهێنێت و (ئەبینین) ئاگر دەیخوات و دەیسوتێنێت و لە ناوی دەبات، (ئەی محمد)ﷺ پێیان بڵێ: خۆ ژمارەیەک پێغەمبەر لە پێش منەوە رەوانەکران بۆتان بەچەندەها بەڵگەو نیشانەی ئاشکراوە و بەو داخوازیەشەوە کەوتتان، جا بۆ کوشتانن و (شەهیدتان کردن) ئەگەر ئێوە راستگۆن؟!

(١٨٤) خۆ ئەگەر بروایان پێنەکردیت، ئەوە بەڕاستی زۆرێک لە پێغەمبەرانی پێش تۆ بروایان پێ نەکراوە هەرچەندە جۆرەها موعجیزە و نامەی پڕ لە ستایش و ئامۆژگاری و کتێبی روناککەرەوەیان هێنابوو.

(١٨٥) هەموو کەسێک دەبێت بمرێت و مردن بچێژێت، تەنها لە رۆژی قیامەتدا کرێ و پاداشتان بەتەواوی پێ دەدرێت (دەرئەنجامی کردەوەکانتان دێتەوە رێتان) ئەوسا ئەوەی دوور خرایەوە لە ئاگری دۆزەخ و خرایە بەهەشتەوە، ئەوە بەڕاستی سەرفراز بووە، ژیانی دنیاش بێجگە لەوەی کە رابواردنێکی خەڵەتێنەرە شتێکی تر نیە.

(١٨٦) سوێند بێت بێگومان تاقی دەکرێنەوە لە ماڵ و دارایی و خۆیشتاندا (زیان لە سامانتاندا دەکەن، خۆتان توشی ناخۆشی و ئازار دەبن) هەروەها سوێند بێت لە خاوەنانی کتێبی پێش خۆتان و لە موشریک و هاوەڵگەرانەوە ئازارێکی زۆر دەبیسن (ئەوەندە بوختان و قسەی نابەجێتان بۆ هەڵدەبەستن، وەک ئازار بەرگوێتان بکەوێت وایە)، بەڵام ئەگەر خۆڕاگر بن و پارێزکار بن و لە خوا بترسن (لە سنوور دەرنەچن)، بەڕاستی ئەو هەڵوێستە لەکارە پەسەندو کردەوە پایەدارەکانە.

وَإِذْ أَخَذَ ٱللَّهُ مِيثَٰقَ ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْكِتَٰبَ لَتُبَيِّنُنَّهُۥ لِلنَّاسِ
وَلَا تَكْتُمُونَهُۥ فَنَبَذُوهُ وَرَآءَ ظُهُورِهِمْ وَٱشْتَرَوْا۟ بِهِۦ ثَمَنًا
قَلِيلًا ۖ فَبِئْسَ مَا يَشْتَرُونَ ﴿١٨٧﴾ لَا تَحْسَبَنَّ ٱلَّذِينَ يَفْرَحُونَ
بِمَآ أَتَوا۟ وَّيُحِبُّونَ أَن يُحْمَدُوا۟ بِمَا لَمْ يَفْعَلُوا۟ فَلَا تَحْسَبَنَّهُم
بِمَفَازَةٍ مِّنَ ٱلْعَذَابِ ۖ وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿١٨٨﴾ وَلِلَّهِ مُلْكُ
ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۗ وَٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ ﴿١٨٩﴾ إِنَّ فِى
خَلْقِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَٱخْتِلَٰفِ ٱلَّيْلِ وَٱلنَّهَارِ لَءَايَٰتٍ
لِّأُو۟لِى ٱلْأَلْبَٰبِ ﴿١٩٠﴾ ٱلَّذِينَ يَذْكُرُونَ ٱللَّهَ قِيَٰمًا وَقُعُودًا
وَعَلَىٰ جُنُوبِهِمْ وَيَتَفَكَّرُونَ فِى خَلْقِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ
رَبَّنَا مَا خَلَقْتَ هَٰذَا بَٰطِلًا سُبْحَٰنَكَ فَقِنَا عَذَابَ ٱلنَّارِ ﴿١٩١﴾
رَبَّنَآ إِنَّكَ مَن تُدْخِلِ ٱلنَّارَ فَقَدْ أَخْزَيْتَهُۥ ۖ وَمَا لِلظَّٰلِمِينَ مِنْ
أَنصَارٍ ﴿١٩٢﴾ رَّبَّنَآ إِنَّنَا سَمِعْنَا مُنَادِيًا يُنَادِى لِلْإِيمَٰنِ أَنْ
ءَامِنُوا۟ بِرَبِّكُمْ فَـَٔامَنَّا ۚ رَبَّنَا فَٱغْفِرْ لَنَا ذُنُوبَنَا وَكَفِّرْ عَنَّا
سَيِّـَٔاتِنَا وَتَوَفَّنَا مَعَ ٱلْأَبْرَارِ ﴿١٩٣﴾ رَبَّنَا وَءَاتِنَا مَا وَعَدتَّنَا
عَلَىٰ رُسُلِكَ وَلَا تُخْزِنَا يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ ۗ إِنَّكَ لَا تُخْلِفُ ٱلْمِيعَادَ ﴿١٩٤﴾

(١٨٧) (یاد بێنەرەوە) کاتێک خوا پەیمانی وەرگرت لەوانەی کتێبیان پێ بەخشراوە کە روونی بکەنەوە بۆ خەڵکی و مەرامەکانی باس بکەن و نەیشارنەوە، کەچی خستیانە پشت خۆیان و بە نرخێکی هەرزان فرۆشتیان (ئەگەر هەموو دنیاش بێت، دینی بۆ بفرۆشی هەرزان فرۆشراوە و زەرەرێکی بێ سنوورە) ئای کە شتێکی بێ نرخیان کڕیوە و دەستیان کەوتووە.

(١٨٨) وا گومان مەبە بەوانەی دڵخۆشن بەوەی کە هەیانەو حەزدەکەن باس بکرێن و خەڵکی سوپاسیان بکات لەسەر کارو چاکەیەک کە نەیانکردووە، ئەوە هەرگیز وامەزانە ئەوانە لە دەست سزا رزگاریان دەبێت، بەڵکو سزایەکی بە ئێش چاوەڕێیانە.

(١٨٩) هەرچی لە ئاسمانەکان و زەویدا هەیە هەر خوا خاوەنیانە و ئەو خوایە دەسەڵاتی بەسەر هەموو شتێکدا هەیە.

(١٩٠) بەڕاستی لە دروستکردنی ئاسمانەکان و زەویدا و لە ئاڵوگۆڕی شەو و رۆژدا بەڵگە و نیشانەی زۆر هەن بۆ کەسانی ژیر و هۆشمەند...

(١٩١) ئەوانەی یادی خوا دەکەن لەکاتێکدا کە بەپێوەن یان دانیشتوون یان راکشاوون (لە هیچ حاڵەتێکدا یادی ئەوزاتە فەرامۆش ناکەن)، هەمیشە بیردەکەنەوە لە دروست بوونی ئاسمانەکان و زەوی (بیردەکەنەوە لە هەموو وردەکاریەک، سەرنجی هەموو دیاردەیەک دەدەن، سەرئەنجام دەڵێن): پەروەردگارا تۆ ئەم هەموو دروست کراوانەت بێهودە و بێ ئامانج دروست نەکردووە، پاکیی و بێگەردیی شایستەی تۆیە، دە تۆش بمانپارێزە لە سزای ئاگری دۆزەخ.

(١٩٢) پەروەردگارا بەڕاستی تۆ هەرکەس بخەیتە ناو ئاگری دۆزەخەوە، ئەوە ئیتر شەرمەزارو ریسواو خەجاڵەتت کردووە، (جا بێگومان لەوێ) ستەمکاران هیچ جۆرە پشتیوانێکیان نیە.

(١٩٣) پەروەردگارا؛ بەڕاستی ئێمە گوێمان لە بانگخوازێک بوو، بانگی کردین بۆ ئیمان و (دەیفەرموو): ئیمان بهێنن بە پەروەردگارتان جا ئێمەش (بێ دوودڵی)، خێرا باوەڕمان هێناو (وتمان): پەروەردگارا؛ دەتۆش لەگوناهو هەڵەکانمان خۆش ببە، چاوپۆشی بکە لەکردارە ناپەسەندەکانمان و (لەسەر رێبازی) چاکان و (بەختەوەران) بمانمرێنە و لەگەڵ ئەواندا کۆمان بکەرەوە.

(١٩٤) پەروەردگارا؛ ئەو بەڵێنانەشمان بۆ ئەنجام بدە کە لەسەر زاری پێغەمبەرانتدا بەنێمەت داوە (کە سەرکەوتنە لە دنیاداو بەهەشتی بەرینە لە داهاتوودا) و لە رۆژی قیامەتیشدا خەجاڵەت و روو زەردمان مەکە، بێگومان تۆ بەڵێن شکێن نیت و بەڵێنی خۆت دەبەیتە سەر.

فَٱسۡتَجَابَ لَهُمۡ رَبُّهُمۡ أَنِّي لَآ أُضِيعُ عَمَلَ عَٰمِلٖ مِّنكُم مِّن ذَكَرٍ أَوۡ أُنثَىٰۖ بَعۡضُكُم مِّنۢ بَعۡضٖۖ فَٱلَّذِينَ هَاجَرُواْ وَأُخۡرِجُواْ مِن دِيَٰرِهِمۡ وَأُوذُواْ فِي سَبِيلِي وَقَٰتَلُواْ وَقُتِلُواْ لَأُكَفِّرَنَّ عَنۡهُمۡ سَيِّـَٔاتِهِمۡ وَلَأُدۡخِلَنَّهُمۡ جَنَّٰتٖ تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُ ثَوَابٗا مِّنۡ عِندِ ٱللَّهِۚ وَٱللَّهُ عِندَهُۥ حُسۡنُ ٱلثَّوَابِ ﴿١٩٥﴾ لَا يَغُرَّنَّكَ تَقَلُّبُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ فِي ٱلۡبِلَٰدِ ﴿١٩٦﴾ مَتَٰعٞ قَلِيلٞ ثُمَّ مَأۡوَىٰهُمۡ جَهَنَّمُۖ وَبِئۡسَ ٱلۡمِهَادُ ﴿١٩٧﴾ لَٰكِنِ ٱلَّذِينَ ٱتَّقَوۡاْ رَبَّهُمۡ لَهُمۡ جَنَّٰتٞ تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَا نُزُلٗا مِّنۡ عِندِ ٱللَّهِۗ وَمَا عِندَ ٱللَّهِ خَيۡرٞ لِّلۡأَبۡرَارِ ﴿١٩٨﴾ وَإِنَّ مِنۡ أَهۡلِ ٱلۡكِتَٰبِ لَمَن يُؤۡمِنُ بِٱللَّهِ وَمَآ أُنزِلَ إِلَيۡكُمۡ وَمَآ أُنزِلَ إِلَيۡهِمۡ خَٰشِعِينَ لِلَّهِ لَا يَشۡتَرُونَ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ ثَمَنٗا قَلِيلًاۚ أُوْلَٰٓئِكَ لَهُمۡ أَجۡرُهُمۡ عِندَ رَبِّهِمۡۗ إِنَّ ٱللَّهَ سَرِيعُ ٱلۡحِسَابِ ﴿١٩٩﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱصۡبِرُواْ وَصَابِرُواْ وَرَابِطُواْ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ لَعَلَّكُمۡ تُفۡلِحُونَ ﴿٢٠٠﴾

سُورَةُ النِّسَاءِ

(١٩٥) (کاتێک ئیمانداران بەم شێوەیە نزایان کرد، کە پەروەردگای ئازیزیان قێریان دەکات) بێگومان ئەو زاتە دوعاکانیان لێوەردەگرێت (بە هاناو هاواریانەوە دەچێت بۆیە دەفەرموێت): بەڕاستی من هەوڵ و کۆشش و کارو کردەوەی هیچ کام لە ئێوە بەزایە نادەم، چ نێرینە و پیاوتان، چ مێینە و ئافرەتتان(چونکە) هاوکاری یەکتر بوون (لە چاکەو چاکەکاریدا)، جا ئەوانەی کۆچیان کردو لە شوێنەواری خۆیان دەربەدەرکران و ئازارو ئەشکەنجەدران لە پێناوی مندا و جەنگان و شەهیدکران، بەڕاستی سوێند بێت چاوپۆشی دەکەم لە هەڵەو گوناهەکانیان و دەیانخەمە باخەکانی بەهەشتەوە کە چەندەها رووبار بەژێر درەختەکانیداو بەردەم کۆشکەکانیدا دەڕوات، ئەمەش پاداشتێکە لە لایەن خواوە (پێشکەشیان دەکرێت) خوا پاداشتی چاک و جوانی لایە (بۆ تێکۆشەران).

(١٩٦) (ئەی ئیماندار) هەرگیز هێزو دەسەڵاتی ئەوانەی بێباوەڕن لە وڵاتاندا تۆ لەخشتە نەبات.

(١٩٧) (ئەوە هەرهەمووی) رابواردنێکی کەمە (چونکە) لەوەودوا شوێن و جێگەیان دۆزەخە، کە ناخۆشترین جێگە و رێگەیە.

(١٩٨) بەڵام ئەوانەی کە پارێزکارن و لە سزای پەروەردگاریان دەترسن (جێگە و رێگەیان) باخەکانی بەهەشتە کە چەندەها رووبار بەژێر درەختەکانیداو بەبەردەم کۆشکەکانیدا دەڕوات، هاوڕێ لەگەڵ ژیانی هەمیشەیی لەوێدا، ئەو شوێنانەش لەلایەن خواوە ئامادەکراوە، بۆ میوانداری هەمیشەیی بەختەوەران، ئەڵبەتە ئەوبەشەی کە لای خوایە چاکترو بەنرخترە بۆ چاکەکاران وخواناسان.

(١٩٩) بەڕاستی هەندێ کەس هەن لە خاوەنانی کتێب کە باوەڕی بەخوا پتەو و دامەزراوە، هەروەها بەو (قورئانەش) کە بۆ ئێوە رەوانەکراوە و بەو کتێبانەش بۆ خۆیان پێشتر رەوانە کراوە، لەکاتێکدا ئەوانە ترسی خوایان لە دڵدایە و مەبەستیانە خوا لێیان رازی بێت، ئایەتەکانی خوا بەنرخێکی کەم (یاخود بەهیچ نرخێک) نافرۆشن، ئەوانە پاداشتی(ئیمان و باوەڕی) خۆیان لای پەروەردگاریان وەردەگرن، بەڕاستی خوا بەخێرایی لێپرسینەوە ئەنجام دەدات (تا بەزوویی بەختەوەران بخاتە بەهەشتەوە و ناپوختەکانیش لە دۆزەخ توند بکات).

(٢٠٠) ئەی ئەوانەی کە باوەڕتان هێناوە خۆگربن و خۆڕاگریی و ئارامگریی بەسەر خۆتاندا بهێنن، نەبەزن لە خۆگری مانەوەتان لە سەنگەردا، هەوڵ بدەن هەمیشە لە سەنگەری خەبات وکۆششدا بن، لە خوا بترسن و پارێزکاربن بۆ ئەوەی سەرفرازیی (هەمیشەیی) بەدەست بهێنن.



بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُواْ رَبَّكُمُ ٱلَّذِي خَلَقَكُم مِّن نَّفۡسٖ وَٰحِدَةٖ وَخَلَقَ مِنۡهَا زَوۡجَهَا وَبَثَّ مِنۡهُمَا رِجَالٗا كَثِيرٗا وَنِسَآءٗۚ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ ٱلَّذِي تَسَآءَلُونَ بِهِۦ وَٱلۡأَرۡحَامَۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلَيۡكُمۡ رَقِيبٗا ﴿١﴾ وَءَاتُواْ ٱلۡيَتَٰمَىٰٓ أَمۡوَٰلَهُمۡۖ وَلَا تَتَبَدَّلُواْ ٱلۡخَبِيثَ بِٱلطَّيِّبِۖ وَلَا تَأۡكُلُوٓاْ أَمۡوَٰلَهُمۡ إِلَىٰٓ أَمۡوَٰلِكُمۡۚ إِنَّهُۥ كَانَ حُوبٗا كَبِيرٗا ﴿٢﴾ وَإِنۡ خِفۡتُمۡ أَلَّا تُقۡسِطُواْ فِي ٱلۡيَتَٰمَىٰ فَٱنكِحُواْ مَا طَابَ لَكُم مِّنَ ٱلنِّسَآءِ مَثۡنَىٰ وَثُلَٰثَ وَرُبَٰعَۖ فَإِنۡ خِفۡتُمۡ أَلَّا تَعۡدِلُواْ فَوَٰحِدَةً أَوۡ مَا مَلَكَتۡ أَيۡمَٰنُكُمۡۚ ذَٰلِكَ أَدۡنَىٰٓ أَلَّا تَعُولُواْ ﴿٣﴾ وَءَاتُواْ ٱلنِّسَآءَ صَدُقَٰتِهِنَّ نِحۡلَةٗۚ فَإِن طِبۡنَ لَكُمۡ عَن شَيۡءٖ مِّنۡهُ نَفۡسٗا فَكُلُوهُ هَنِيٓـٔٗا مَّرِيٓـٔٗا ﴿٤﴾ وَلَا تُؤۡتُواْ ٱلسُّفَهَآءَ أَمۡوَٰلَكُمُ ٱلَّتِي جَعَلَ ٱللَّهُ لَكُمۡ قِيَٰمٗا وَٱرۡزُقُوهُمۡ فِيهَا وَٱكۡسُوهُمۡ وَقُولُواْ لَهُمۡ قَوۡلٗا مَّعۡرُوفٗا ﴿٥﴾ وَٱبۡتَلُواْ ٱلۡيَتَٰمَىٰ حَتَّىٰٓ إِذَا بَلَغُواْ ٱلنِّكَاحَ فَإِنۡ ءَانَسۡتُم مِّنۡهُمۡ رُشۡدٗا فَٱدۡفَعُوٓاْ إِلَيۡهِمۡ أَمۡوَٰلَهُمۡۖ وَلَا تَأۡكُلُوهَآ إِسۡرَافٗا وَبِدَارًا أَن يَكۡبَرُواْۚ وَمَن كَانَ غَنِيّٗا فَلۡيَسۡتَعۡفِفۡۖ وَمَن كَانَ فَقِيرٗا فَلۡيَأۡكُلۡ بِٱلۡمَعۡرُوفِۚ فَإِذَا دَفَعۡتُمۡ إِلَيۡهِمۡ أَمۡوَٰلَهُمۡ فَأَشۡهِدُواْ عَلَيۡهِمۡۚ وَكَفَىٰ بِٱللَّهِ حَسِيبٗا ﴿٦﴾

## سوورەتی (النساء)

بەناوی خوای بەخشندە و میهرەبان

(١) ئەی خەڵكینە لە خەشم و ناڕەزایی ئەو پەروەردگارەتان خۆ بپارێزن كە ئێوەی لە تاكە نەفسێك دروست كردووە، هەر لەو نەفسەش هاوسەرەكەی بەدی هێناو لەو دووانە پیاوان و ژنانی زۆری خستۆتەوە و بڵاوكردەوە، هەروەها لەو خوایە بترسن كە لە یەكتر داوا دەكەن بەناوهێنانی ئەوەوە، هەوڵ بدەن پەیوەندی خزمایەتیش بپارێزن و (پتەوی بكەن) چونكە بەڕاستی خوا (هەمیشە و بەردەوام) چاودێرە بەسەرتانەوە.

(٢) (خەڵكینە) ماڵ و سامانی هەتیوان بدەنەوە دەست خۆیان(كاتێك گەورە بوون وفامیان كردەوە) ، ماڵی خراپ و پیسی خۆتان مەگۆڕنەوە بەماڵی چاك و پاكی ئەوان، ماڵ و سامانیان مەخۆن لەگەڵ ماڵ و سامانی خۆتاندا (مەیفەوتێنن) بەڕاستی ئەو كارە ستەم و گوناهێكی گەورەیە.

(٣) ئەگەر ترسان لە ئەنجام نەدانی دادپەروەری لەگەڵ كچە بێ باوكەكاندا (ئەگەر بیانكەنە هاوسەرتان، ئەوە واز لەوان بهێنن)، ئەوە لە ئافرەتانی تر كە حەڵاڵن بۆتان ژن مارە بكەن دوو دوو، یان سیان سیان، یان چوار چوار، (ئەڵبەتە لە یەك هاوسەر زیاتر مەرج و باروودۆخی تایبەتی خۆی هەیە) خۆ ئەگەر ترسان لەوەی كە نەتوانن دادپەروەر بن (لەنێوان هاوسەرەكانتاندا) ئەوە با یەك ژن مارە بكەن، یان ئەو كەنیزەكانەی كە هەتانن (كە دیاردەیەكی كاتی بوو، ئیسلام بنەبڕی كرد) ، ئەوەی كە باسكرا نزیكترە لەوەی ستەم نەكەن (ئەگەر پەیڕەوی بكەن).

(٤) مارەیی ئافرەتان بدەن بەوپەڕی دڵفراوانی و ئاسوودەییەوە، خۆ ئەگەر بەئارەزوو ویستی خۆیان دەستیان هەڵگرت لە هەندێك مارەیی و بەخشییان بەئێوە، ئێوە بۆتان هەیە بیخۆن و بەكاری بهێنن و بەبێ دوودڵی نۆشی بكەن (سوودی لێ وەربگرن).

(٥) ماڵ و سامانتان مەدەن بەكەم عەقڵ و پیاو خراپان(كە ئێوە بەرپرسن لە ماڵیان)، لەكاتێكدا خوا كردوویەتی بەهۆی ژیان و پایەداری و هەستانەوەتان، بەڵكو تەنها بەشیان بدەن بۆ خۆراك و پۆشاك، بەجوانی قسەی ڕاست و دروستیان بۆ بكەن (تەرەیان مەكەن).

(٦) هەتیوان تاقی بكەنەوە (بەوەی كە هەندێك پارەیان بدەنێ و خۆتان سەرپەرشتییان بكەن) هەتا ئەوكاتەی كە وەختی ئەوەیان دێت هاوسەر بگرن، ئەوسا ئەگەر هەستتان كرد ژیرو سەلارن، پارە و سامانەكەیان پێ بدەنەوە، نەكەن ماڵ و سامانیان بخۆن بەزیادەڕەوی لەخەرج كردنیدا لە ترسی ئەوەی ئەوەكو گەورە بن و زوو لە دەستتان بسێننەوە، جا ئەوەی دەوڵەمەندە بادەستی بپارێزێت و ئەوەش كە هەژارە بالێی بخوات و لە سنوور دەرنەچێت و زیادەڕەوی نەكات، جاكاتێك ماڵ و سامانەكانیان تەسلیم دەكەنەوە ئەوە شایەتیان لەسەر بگرن (هەرچەندە) تەنها خوا بەسە بۆ لێپرسینەوە و چاودێری.

لِّلرِّجَالِ نَصِيبٌ مِّمَّا تَرَكَ ٱلْوَٰلِدَانِ وَٱلْأَقْرَبُونَ وَلِلنِّسَآءِ نَصِيبٌ مِّمَّا تَرَكَ ٱلْوَٰلِدَانِ وَٱلْأَقْرَبُونَ مِمَّا قَلَّ مِنْهُ أَوْ كَثُرَ نَصِيبًا مَّفْرُوضًا ﴿٧﴾ وَإِذَا حَضَرَ ٱلْقِسْمَةَ أُو۟لُوا۟ ٱلْقُرْبَىٰ وَٱلْيَتَـٰمَىٰ وَٱلْمَسَـٰكِينُ فَٱرْزُقُوهُم مِّنْهُ وَقُولُوا۟ لَهُمْ قَوْلًا مَّعْرُوفًا ﴿٨﴾ وَلْيَخْشَ ٱلَّذِينَ لَوْ تَرَكُوا۟ مِنْ خَلْفِهِمْ ذُرِّيَّةً ضِعَـٰفًا خَافُوا۟ عَلَيْهِمْ فَلْيَتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَلْيَقُولُوا۟ قَوْلًا سَدِيدًا ﴿٩﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَأْكُلُونَ أَمْوَٰلَ ٱلْيَتَـٰمَىٰ ظُلْمًا إِنَّمَا يَأْكُلُونَ فِى بُطُونِهِمْ نَارًا وَسَيَصْلَوْنَ سَعِيرًا ﴿١٠﴾ يُوصِيكُمُ ٱللَّهُ فِىٓ أَوْلَـٰدِكُمْ لِلذَّكَرِ مِثْلُ حَظِّ ٱلْأُنثَيَيْنِ فَإِن كُنَّ نِسَآءً فَوْقَ ٱثْنَتَيْنِ فَلَهُنَّ ثُلُثَا مَا تَرَكَ وَإِن كَانَتْ وَٰحِدَةً فَلَهَا ٱلنِّصْفُ وَلِأَبَوَيْهِ لِكُلِّ وَٰحِدٍ مِّنْهُمَا ٱلسُّدُسُ مِمَّا تَرَكَ إِن كَانَ لَهُۥ وَلَدٌ فَإِن لَّمْ يَكُن لَّهُۥ وَلَدٌ وَوَرِثَهُۥٓ أَبَوَاهُ فَلِأُمِّهِ ٱلثُّلُثُ فَإِن كَانَ لَهُۥٓ إِخْوَةٌ فَلِأُمِّهِ ٱلسُّدُسُ مِنۢ بَعْدِ وَصِيَّةٍ يُوصِى بِهَآ أَوْ دَيْنٍ ءَابَآؤُكُمْ وَأَبْنَآؤُكُمْ لَا تَدْرُونَ أَيُّهُمْ أَقْرَبُ لَكُمْ نَفْعًا فَرِيضَةً مِّنَ ٱللَّهِ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلِيمًا حَكِيمًا ﴿١١﴾

(٧) پیاوان بەشیان هەیە لەو شتانەدا کەباوک و دایک و خزمان بە میراتی لەدوایان بەجێ دەمێنێت، هەروەها ژنانیش بەشیان هەیە لەو شتانەدا کە بە میراتیی لە باوک و دایک و خزمان بەجێ دەمێنێت، لە کەم و زۆری بەشی هەرکەسێک دیاری کراوە و، دەبێت بیدرێتێ.

(٨) خۆ ئەگەر کاتێک لە دابەش کردنی میراتیدا خزمان و هەتیوان و هەژاران ئامادە بوون، ئەوە لەو میراتیە بەشیان بدەن و بەجوانی قسەیان بۆ بکەن (پیایاندا هەڵمەشاخێن).

(٩) دەبا ئەوانەش کە (دوورنیە بەم نزیکانە بمرن) و نەوەی لاواز و ساوایان لەدوا بەجێ بمێنێت، خواناسی و ئایینداری بکەنە پیشەیان و گوفتاری چاک و بەجێ بڵێن (وەسیەت بکەن، بێگومان خوا دەمێنێت بۆ منداڵی جێماویان ئەگەر خواناس و گوفتارجوان و بەخشندە بن).

(١٠) بەڕاستی ئەوانەی کە ماڵی هەتیووان بە ناحەق و ستەم دەخۆن، بێگومان ئەوانە تەنها ئاگر دەخۆن و ئەو ماڵە دەبێتە ئاگر لە سکیاندا، لە قیامەتیشدا دەچنە ناو ئاگری دۆزەخەوە.

(١١) خوا ڕێنموویتان دەکات و فەرمانتان پێ دەدا دەربارەی نەوەکانتان لە بواری میراتی گرتندا (ئەویش ئەوەیە) کە بەشی نێرینەیەکیان ئەندازەی بەشی دوو مێینەیانە، خۆ ئەگەر منداڵەکان تەنها ئافرەت بوون (دووان) و لە دووان زیاتر بوون ئەوە دووبەش لە سێ بەشی میراتیەکە لەوان بەش دەکرێت، خۆ ئەگەر مردووەکە تەنها کچێکی هەبوو ئەوە نیوەی داراییەکەی دەدرێتێ، شەشیەکیش دەدرێت بەهەریەک لە دایک و باوکی ئەگەر مردووەکە منداڵی هەبوو، خۆ ئەگەر مردووەکە منداڵی نەبوو، تەنها دایک و باوکی هەبوو ئەوە دایکی سێیەکی دەبات و ئەوی تریشی بۆ باوکی دەبێت، خۆ ئەگەر باوکی نەبوو دایک و براو خوشکی هەبوو ئەوە شەشیەکی میرات بۆ دایکی دەبێت، ئەمانە هەمووی دوای وەسیەتێک کە مردووەکە کردوویەتی و دانەوەی قەرزو قەرزاری دەبێت، ئێوە نازانن کە باوانتان و نەوەکانتان نازانن کام لایان سوودی زیاترە بۆتان (لەبەرئەوە بەگوێرەی فەرمانی خوا میراتی دابەش بکەن، ئابەم شێوەیە میراتی دابەش کردن) فەرزە لەسەرتان کە پەیڕەوی بکەن چونکە لەلایەن خواوە دیاریکراوە، بەڕاستی خوایش هەمیشە و بەردەوام زاناو دانایە.



۞ وَلَكُمْ نِصْفُ مَا تَرَكَ أَزْوَاجُكُمْ إِن لَّمْ يَكُن لَّهُنَّ وَلَدٌ فَإِن كَانَ لَهُنَّ وَلَدٌ فَلَكُمُ الرُّبُعُ مِمَّا تَرَكْنَ مِنۢ بَعْدِ وَصِيَّةٍ يُوصِينَ بِهَآ أَوْ دَيْنٍ وَلَهُنَّ الرُّبُعُ مِمَّا تَرَكْتُمْ إِن لَّمْ يَكُن لَّكُمْ وَلَدٌ فَإِن كَانَ لَكُمْ وَلَدٌ فَلَهُنَّ الثُّمُنُ مِمَّا تَرَكْتُم مِّنۢ بَعْدِ وَصِيَّةٍ تُوصُونَ بِهَآ أَوْ دَيْنٍ وَإِن كَانَ رَجُلٌ يُورَثُ كَلَٰلَةً أَوِ امْرَأَةٌ وَلَهُۥٓ أَخٌ أَوْ أُخْتٌ فَلِكُلِّ وَٰحِدٍ مِّنْهُمَا السُّدُسُ فَإِن كَانُوٓا أَكْثَرَ مِن ذَٰلِكَ فَهُمْ شُرَكَآءُ فِى الثُّلُثِ مِنۢ بَعْدِ وَصِيَّةٍ يُوصَىٰ بِهَآ أَوْ دَيْنٍ غَيْرَ مُضَآرٍّ وَصِيَّةً مِّنَ اللَّهِ وَاللَّهُ عَلِيمٌ حَلِيمٌ ﴿١٢﴾ تِلْكَ حُدُودُ اللَّهِ وَمَن يُطِعِ اللَّهَ وَرَسُولَهُۥ يُدْخِلْهُ جَنَّٰتٍ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا الْأَنْهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَا وَذَٰلِكَ الْفَوْزُ الْعَظِيمُ ﴿١٣﴾ وَمَن يَعْصِ اللَّهَ وَرَسُولَهُۥ وَيَتَعَدَّ حُدُودَهُۥ يُدْخِلْهُ نَارًا خَٰلِدًا فِيهَا وَلَهُۥ عَذَابٌ مُّهِينٌ ﴿١٤﴾

(١٢) هەروەها نیوەی میراتی ژنەکانتان دەدرێت بە ئێوە ئەگەر منداڵیان نەبوو، خۆ ئەگەر منداڵیان هەبوو ئەوە چواریەکی میراتی ژنەکانتان بۆ هەیە، ئەمانە هەمووی دوای بەجێهێنانی وەسیەتی ژنان و دانەوەی قەرزیان و بۆ ژنان چواریەکی میراتی ئێوە بڕیاردراوە ئەگەر ئێوە منداڵتان لەدوا بەجێ نەمابێت، خۆ ئەگەر منداڵتان هەبوو ئەوە هەشتیەک بۆ ژنەکە دەبێت لەوەی کە بە میراتی لێتان بەجێ ماوە، ئەمانە هەمووی دوای بەجێهێنانی وەسیەتتان و دانەوەی قەرزەکانتان، خۆ ئەگەر پیاوێک یان ئافرەتێک مرد منداڵ و باوک و باپیرو براو خوشکی دایک و باوکی نەبوو، بەڵکو تەنها خوشکێک یان برایەکی دایکی هەبوو، ئەوە شەشیەک بەشی هەر یەکێک لەوان دەبێت، خۆ ئەگەر براو خوشکی دایکی لە یەک زیاتر بوون ئەوە هەموویان هاوبەشن لە سێیەکی میراتیەکەدا (بەیەکسانی ژن و پیاو) ئەمانە هەمووی دوای وەسیەتێک کە دەکرێت، دانەوەی قەرز، لەکاتێکدا ئەو وەسیەتە زیانبەخش نەبێت بەمیراتگران، ئەمانە هەر هەمووی بڕیار و فرمانن لەلایەن خوای گەورەوە و ئەو خوایە زانا و بە حیلم و حەوسەڵەیە.

(١٣) ئەوانەی باسکران (دەربارەی هەتیوان و چۆنیەتی دابەشکردنی میراتی) ئەو سنوورانەن خوا دیاری کردوون، جا ئەو کەسەی فەرمانبەرداری خواو پێغەمبەرەکەی بکات (لەم بوارەداو لە هەموو بوارەکانی تردا)، ئەوە خوا دەیخاتە ناو باخەکانی بەهەشتەوە: کە چەندەها رووبار بەژێر درەختەکانیدا دەڕوات، هاوڕێ لەگەڵ ژیانی نەبڕاوە تیایدا، بێگومان هەر ئەوەشە سەرفرازیی گەورە و دەستکەوتی بێ سنوور.

(١٤) (بەڵام) ئەوەی یاخی بێت لە خواو پێغەمبەرەکەی و دەرچێت لە سنوورەکانی، ئەوە خوا دەیخاتە ناو ئاگرێکەوە کە بۆ هەمیشە تیایدا دەمێنێتەوە و سزایەکی سەر شۆڕکەر و ریسواکەری بۆ هەیە.

وَٱلَّٰتِي يَأۡتِينَ ٱلۡفَٰحِشَةَ مِن نِّسَآئِكُمۡ فَٱسۡتَشۡهِدُواْ عَلَيۡهِنَّ أَرۡبَعَةٗ مِّنكُمۡۖ فَإِن شَهِدُواْ فَأَمۡسِكُوهُنَّ فِي ٱلۡبُيُوتِ حَتَّىٰ يَتَوَفَّىٰهُنَّ ٱلۡمَوۡتُ أَوۡ يَجۡعَلَ ٱللَّهُ لَهُنَّ سَبِيلٗا ﴿١٥﴾ وَٱلَّذَانِ يَأۡتِيَٰنِهَا مِنكُمۡ فَـَٔاذُوهُمَاۖ فَإِن تَابَا وَأَصۡلَحَا فَأَعۡرِضُواْ عَنۡهُمَآۗ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ تَوَّابٗا رَّحِيمًا ﴿١٦﴾ إِنَّمَا ٱلتَّوۡبَةُ عَلَى ٱللَّهِ لِلَّذِينَ يَعۡمَلُونَ ٱلسُّوٓءَ بِجَهَٰلَةٖ ثُمَّ يَتُوبُونَ مِن قَرِيبٖ فَأُوْلَٰٓئِكَ يَتُوبُ ٱللَّهُ عَلَيۡهِمۡۗ وَكَانَ ٱللَّهُ عَلِيمًا حَكِيمٗا ﴿١٧﴾ وَلَيۡسَتِ ٱلتَّوۡبَةُ لِلَّذِينَ يَعۡمَلُونَ ٱلسَّيِّـَٔاتِ حَتَّىٰٓ إِذَا حَضَرَ أَحَدَهُمُ ٱلۡمَوۡتُ قَالَ إِنِّي تُبۡتُ ٱلۡـَٰٔنَ وَلَا ٱلَّذِينَ يَمُوتُونَ وَهُمۡ كُفَّارٌۚ أُوْلَٰٓئِكَ أَعۡتَدۡنَا لَهُمۡ عَذَابًا أَلِيمٗا ﴿١٨﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا يَحِلُّ لَكُمۡ أَن تَرِثُواْ ٱلنِّسَآءَ كَرۡهٗاۖ وَلَا تَعۡضُلُوهُنَّ لِتَذۡهَبُواْ بِبَعۡضِ مَآ ءَاتَيۡتُمُوهُنَّ إِلَّآ أَن يَأۡتِينَ بِفَٰحِشَةٖ مُّبَيِّنَةٖۚ وَعَاشِرُوهُنَّ بِٱلۡمَعۡرُوفِۚ فَإِن كَرِهۡتُمُوهُنَّ فَعَسَىٰٓ أَن تَكۡرَهُواْ شَيۡـٔٗا وَيَجۡعَلَ ٱللَّهُ فِيهِ خَيۡرٗا كَثِيرٗا ﴿١٩﴾

(١٥) ئەو ئافرەتانەی کە زینا دەکەن لە ژنانتان ئـەوە چوار شایەتیان لە خۆتان لەسەر بگـرن، جا ئەگەر شایەتیانداً، ئێوە لە ماڵدا بەندیان بکـەن، تـا مـردن یەخـەیان پێدەگرێـت یـان خـوا دەروویەکیان لیٚ دەکاتەوە.

(١٦) ئـەو ژن و پیاوەتـان، یـان ئـەو کـوڕ و کچەتان کە زینایان لە دەست دەقـەومێت، ئـەوە ئێـوە لێیـان بـدەن و ئازاریـان بـدەن، خۆ ئەگـەر تەوبەیان کردو خۆیان پەروەردە و چاککرد، ئـەوە ئێوە وازیان لیٚ بـهێنن (تەعنـەیان لیٚ مـەدەن، بـەچاوی سـوک تەماشـایان مەکـەن) چونکـە بەڕاستی خوا هەمیشە تەوبە وەرگرە و بـەڕەحم و میهرەبانیشە.

(١٧) خوای گەورە تەنها ئەو تەوبەو پەشـیمانیە قبولٚ دەکات و ئەو کەسانە دەگرێتەوە کە گوناهـ و نادروستی بەنەفامی و نەزانی ئـەنجام دەدەن و پاشـان بـەزوویی تەوبـە دەکـەن و پەشـیمانی دەردەبڕن، ئا ئەو جۆرە کەسانە خوا تەوبەیان لیٚ وەردەگرێت و هەمیشە و بەردەوام خوا زانایە (بەوەی بەنەزانیی و نەفامی هەڵە و گوناهـ ئـەنجام دەدات) و دانایـە و (دەزانێت کە ئادەمیزاد هەندێک جار لاوازیی رووی تێدەکات و بەهەڵەدا دەچێت، لەبەرئەوە نائومێدی ناکات).

(١٨) تەوبەو پەشیمانی بۆ ئەو کەسانە نیە کە بەردەوامن لەسەر گوناهو تاوان، ئەوکاتەی مردن یەخـەی بەیـەکێکیان گرت ئەوسا بڵێت: ئەوە ئیتر من بەڕاستی لە ئێستەوە تەوبەم کرد، تەوبە لەوانەش وەرناگیرێت کـە بـەکافری دەمـرن، بۆ ئەو جۆرە تاوانبارانە هەموویان سزایەکی بەئێشمان ئامادە کردووە.

(١٩) ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە دروست نیە بۆتان ژنان بە زۆر بکەنە میراتی خۆتان و دەستیان بەسـەردا بگـرن، (وەکو کەلوپەلی تری ناوماڵ)، ناچاریان مەکەن تا هـەندێک مارەییتـان بـۆ بگەڕێننـەوە، مەگـەر ئـەوان گوناهێکی ئاشکراو دیار ئەنجام بدەن، هاوژینییان بەجوانی لەگەڵدا بەرنەسەر، خۆ ئەگەر خۆشتان نەویستن و لێیان بـێزار بـوون، ئەوە دوور نیە و دەشێت حەزتان لە شتێک نەبێت و خوا بیکات بەمایەی خێرو بێری زۆرو بیٚسنوور.

وَإِنْ أَرَدتُّمُ ٱسْتِبْدَالَ زَوْجٍ مَّكَانَ زَوْجٍ وَءَاتَيْتُمْ إِحْدَىٰهُنَّ قِنطَارًا فَلَا تَأْخُذُوا۟ مِنْهُ شَيْـًٔا ۚ أَتَأْخُذُونَهُۥ بُهْتَـٰنًا وَإِثْمًا مُّبِينًا ﴿٢٠﴾ وَكَيْفَ تَأْخُذُونَهُۥ وَقَدْ أَفْضَىٰ بَعْضُكُمْ إِلَىٰ بَعْضٍ وَأَخَذْنَ مِنكُم مِّيثَـٰقًا غَلِيظًا ﴿٢١﴾ وَلَا تَنكِحُوا۟ مَا نَكَحَ ءَابَآؤُكُم مِّنَ ٱلنِّسَآءِ إِلَّا مَا قَدْ سَلَفَ ۚ إِنَّهُۥ كَانَ فَـٰحِشَةً وَمَقْتًا وَسَآءَ سَبِيلًا ﴿٢٢﴾ حُرِّمَتْ عَلَيْكُمْ أُمَّهَـٰتُكُمْ وَبَنَاتُكُمْ وَأَخَوَٰتُكُمْ وَعَمَّـٰتُكُمْ وَخَـٰلَـٰتُكُمْ وَبَنَاتُ ٱلْأَخِ وَبَنَاتُ ٱلْأُخْتِ وَأُمَّهَـٰتُكُمُ ٱلَّـٰتِىٓ أَرْضَعْنَكُمْ وَأَخَوَٰتُكُم مِّنَ ٱلرَّضَـٰعَةِ وَأُمَّهَـٰتُ نِسَآئِكُمْ وَرَبَـٰٓئِبُكُمُ ٱلَّـٰتِى فِى حُجُورِكُم مِّن نِّسَآئِكُمُ ٱلَّـٰتِى دَخَلْتُم بِهِنَّ فَإِن لَّمْ تَكُونُوا۟ دَخَلْتُم بِهِنَّ فَلَا جُنَاحَ عَلَيْكُمْ وَحَلَـٰٓئِلُ أَبْنَآئِكُمُ ٱلَّذِينَ مِنْ أَصْلَـٰبِكُمْ وَأَن تَجْمَعُوا۟ بَيْنَ ٱلْأُخْتَيْنِ إِلَّا مَا قَدْ سَلَفَ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ غَفُورًا رَّحِيمًا ﴿٢٣﴾

(٢٠) خۆ ئەگەر ویستتان هاوسەرێك بخەنە جێگەی هاوسەرێکی ترو مارەییەکەی (ئاڵتون و سامانێکی) زۆرتان پێدا بوو، ئەوە نابێت هیچ شتێکی لێ بگێڕنەوە و لێی کەم بکەنەوە، ئایا ئەو مارەییەی کە پێتانداوە وەریدەگرنەوە لێیان بەدروست کردنی بوختانێکی ناڕەواو گوناهو ستەمێکی ئاشکرا؟!

(٢١) جا چۆن دروستە مارەییان لێوەربگرنەوە، لەکاتێکدا ئێوە چوونەتە لای یەکترو ژنانیش پەیمان و بەڵێنێکی گەورەو گرنگیان لێ وەرگرتوون (لەکاتی مارەکردنیاندا).

(٢٢) نەکەن ئەو ئافرەتانە مارە بکەن کە پێشتر باوکتان مارەی کردبوو، مەگەر ئەوەی کە رابوورد (لەسەردەمی نەفامیدا پێش حەرام کردنی) بەڕاستی ئەو کارە گوناهێکی گەورە و ناشرین و ناپەسەندە و رێبازێکی خراپە.

(٢٣) ( ئیمانداران، ئەم ئافرەتانە) مارەکردنیان حەرامکراوە لەسەرتان: دایکانتان، کچەکانتان، خوشکەکانتان، پورەکانتان (خوشکی باوك)، پورەکانتان (خوشکی دایك)، برازاتان، خوشکەزاتان، ئەو دایکانەی کە شیریان داونەتێ، خوشکە شیریەکانتان، دایکی هاوسەرتان (خەسوو)، ئەو کچانەی لە پیاوێکی ترن و لای ئێوە دەژین و پەروەردە دەبن و لەو ژنانەتانن کە چوونەتە لایان (واتە زڕ کچەکانتان)، خۆ ئەگەر نەچووبنە لای دایکی ئەو جۆرە کچانە ئەوە هیچ گوناهتان لەسەر نی یە(مارەیان بکەن)، (هەروەها حەرامە) هاوسەری ئەو کوڕانەتان مارە بکەن کە لەپشتی خۆتانن (واتە بوکەکانتان)، (هەروەها حەرامە) دوو خوشکیش پێکەوە بکەنە هاوسەری خۆتان لە یەك کاتدا، جگە لەوانەی کە رابوورد، بەڕاستی خوا هەمیشەو بەردەوام لێخۆشبوو میهرەبانە.



۞ وَالْمُحْصَنَاتُ مِنَ النِّسَاءِ إِلَّا مَا مَلَكَتْ أَيْمَانُكُمْ ۖ كِتَابَ اللَّهِ عَلَيْكُمْ ۚ وَأُحِلَّ لَكُم مَّا وَرَاءَ ذَٰلِكُمْ أَن تَبْتَغُوا بِأَمْوَالِكُم مُّحْصِنِينَ غَيْرَ مُسَافِحِينَ ۚ فَمَا اسْتَمْتَعْتُم بِهِ مِنْهُنَّ فَآتُوهُنَّ أُجُورَهُنَّ فَرِيضَةً ۚ وَلَا جُنَاحَ عَلَيْكُمْ فِيمَا تَرَاضَيْتُم بِهِ مِن بَعْدِ الْفَرِيضَةِ ۚ إِنَّ اللَّهَ كَانَ عَلِيمًا حَكِيمًا ﴿٢٤﴾ وَمَن لَّمْ يَسْتَطِعْ مِنكُمْ طَوْلًا أَن يَنكِحَ الْمُحْصَنَاتِ الْمُؤْمِنَاتِ فَمِن مَّا مَلَكَتْ أَيْمَانُكُم مِّن فَتَيَاتِكُمُ الْمُؤْمِنَاتِ ۚ وَاللَّهُ أَعْلَمُ بِإِيمَانِكُم ۚ بَعْضُكُم مِّن بَعْضٍ ۚ فَانكِحُوهُنَّ بِإِذْنِ أَهْلِهِنَّ وَآتُوهُنَّ أُجُورَهُنَّ بِالْمَعْرُوفِ مُحْصَنَاتٍ غَيْرَ مُسَافِحَاتٍ وَلَا مُتَّخِذَاتِ أَخْدَانٍ ۚ فَإِذَا أُحْصِنَّ فَإِنْ أَتَيْنَ بِفَاحِشَةٍ فَعَلَيْهِنَّ نِصْفُ مَا عَلَى الْمُحْصَنَاتِ مِنَ الْعَذَابِ ۚ ذَٰلِكَ لِمَنْ خَشِيَ الْعَنَتَ مِنكُمْ ۚ وَأَن تَصْبِرُوا خَيْرٌ لَّكُمْ ۗ وَاللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿٢٥﴾ يُرِيدُ اللَّهُ لِيُبَيِّنَ لَكُمْ وَيَهْدِيَكُمْ سُنَنَ الَّذِينَ مِن قَبْلِكُمْ وَيَتُوبَ عَلَيْكُمْ ۗ وَاللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ ﴿٢٦﴾

(٢٤) (هەروەها حەرامە) لێتان ئەو ئافرەتانەی کە مێردیان هەیە جگە لە کەنیزەکتان (لەو زەمانەدا باو بووە، جا ئەم سنوورانە) خوا بڕیاریداوە لەسەرتان، جگە لەوانەی کە باسکران، حەڵاڵە بۆتان بەهۆی ماڵ و داراییتانەوە هاوسەر بگرن (تا چوار ئافرەت) تا پاک داوێن بن و لە سنووری ڕەوشتی بەرز دەرنەچن، جا لەگەڵ هەر ئافرەتێکدا هاوسەریتان گرت ئەوە فەرزە کە مارەییەکەیان بدەنێ و هیچ گوناهیش نیە لەسەرتان لە کەم کردنەوەی ئەو مارەییەی لەسەری ڕێککەوتبوون لە دوای دیاریکردنی، بەڕاستی خوا هەمیشە بەردەوام زاناو دانایە.

(٢٥) ئەوەش کە نەیتوانی لە ئێوە لەبەر دەست کورتی، ئافرەتانی سەربەستی باوەڕدار مارە بکات، ئەوە با لە کچەکەنیزەکە ئیماندارەکانتان بخوازێت، خوایش زانایە کە ڕادەی ئیمانتان چەندە و چۆنە، ئێوە هەندێکتان لە هەندێکتانن (هەمووتان لە ئادەم وحەوان و ئەم جیاوازیە چینایەتیە شتێکی کاتیە)، لەبەرئەوە ئەو کەنیزەکانە مارە بکەن لەسەر ڕەزامەندی کەس و کارو خاوەنەکانیان و مارەییان بەچاکی پێ بدەن، لەکاتێکدا ئەو کەنیزەکانەش پێویستە پاک داوێن بن و دووربن لە داوێن پیسی و دۆست گرتنەوە، خۆ ئەگەر شوویان کردو لەوەودوا داوێن پیسیەکیان ئەنجامدا ئەوە نیوەی سزای ئافرەتانی سەربەست دەدرێن (چونکە ئازادیی تەواویان نەبووە لەو سەردەمەدا)، لەبەر ئەوە مارەکردنیان بۆ ئەوانەتانە کە دەترسێت تووشی هەڵەو گوناه ببێت، خۆڕاگریتان (تا خوا دەرووتان لێدەکاتەوە) چاکترە بۆتان، خوایش لێخۆشبوو و میهرەبانە.

(٢٦) بێگومان خوا دەیەوێت (بەم شێوەیە) هەموو شتێکتان بۆ ڕوون بکاتەوە و ڕێنموویتان بکات بۆ ئەو یاساو بەرنامانەی پێش خۆتان (کە پێغەمبەران هێناویانە لە جیهانی کۆمەڵایەتی و پەیوەندیەکان و ...هتد) و تەوبە و پەشیمانیشتان لێ وەربگرێت، خوا زاناو دانایە.

وَٱللَّهُ يُرِيدُ أَن يَتُوبَ عَلَيۡكُمۡ وَيُرِيدُ ٱلَّذِينَ يَتَّبِعُونَ ٱلشَّهَوَٰتِ أَن تَمِيلُواْ مَيۡلًا عَظِيمٗا ﴿٢٧﴾ يُرِيدُ ٱللَّهُ أَن يُخَفِّفَ عَنكُمۡۚ وَخُلِقَ ٱلۡإِنسَٰنُ ضَعِيفٗا ﴿٢٨﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَأۡكُلُوٓاْ أَمۡوَٰلَكُم بَيۡنَكُم بِٱلۡبَٰطِلِ إِلَّآ أَن تَكُونَ تِجَٰرَةً عَن تَرَاضٖ مِّنكُمۡۚ وَلَا تَقۡتُلُوٓاْ أَنفُسَكُمۡۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ بِكُمۡ رَحِيمٗا ﴿٢٩﴾ وَمَن يَفۡعَلۡ ذَٰلِكَ عُدۡوَٰنٗا وَظُلۡمٗا فَسَوۡفَ نُصۡلِيهِ نَارٗاۚ وَكَانَ ذَٰلِكَ عَلَى ٱللَّهِ يَسِيرًا ﴿٣٠﴾ إِن تَجۡتَنِبُواْ كَبَآئِرَ مَا تُنۡهَوۡنَ عَنۡهُ نُكَفِّرۡ عَنكُمۡ سَيِّـَٔاتِكُمۡ وَنُدۡخِلۡكُم مُّدۡخَلٗا كَرِيمٗا ﴿٣١﴾ وَلَا تَتَمَنَّوۡاْ مَا فَضَّلَ ٱللَّهُ بِهِۦ بَعۡضَكُمۡ عَلَىٰ بَعۡضٖۚ لِّلرِّجَالِ نَصِيبٞ مِّمَّا ٱكۡتَسَبُواْۖ وَلِلنِّسَآءِ نَصِيبٞ مِّمَّا ٱكۡتَسَبۡنَۚ وَسۡـَٔلُواْ ٱللَّهَ مِن فَضۡلِهِۦٓۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ بِكُلِّ شَيۡءٍ عَلِيمٗا ﴿٣٢﴾ وَلِكُلّٖ جَعَلۡنَا مَوَٰلِيَ مِمَّا تَرَكَ ٱلۡوَٰلِدَانِ وَٱلۡأَقۡرَبُونَۚ وَٱلَّذِينَ عَقَدَتۡ أَيۡمَٰنُكُمۡ فَـَٔاتُوهُمۡ نَصِيبَهُمۡۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ شَهِيدًا ﴿٣٣﴾

(٢٧) بێگومان خوا دەیەوێت تەوبە و پەشیمانیتان لیٚ وەربگرێت و لە هەڵەکانتان خۆش بێت، (بەڵام) ئەوانەی شوێن ئارەزووات و هەوەسبازی کەوتوون دەیانەوێت ئێوە لابدەن بە لادانێکی گەورە.

(٢٨) خوا دەیەوێت (بەم بەرنامە و ڕێبازانە) بارتان سووک بکات و کار ئاسانیتان بۆ بکات (چونکە) ئادەمیزاد بە لاوازی دروست کراوە (لە بەرامبەر ئارەزووەکانیەوە خۆڕاگرنیە).

(٢٩) ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە ماڵ و سامانی یەکتر بەناحەق و بەبیٚ بەرامبەر مەخۆن لەنێوان خۆتاندا، مەگەر بازرگانیەک بێت و لەسەر ڕەزامەندی هەموولایەکتان بێت، خۆتان مەکوژن و (یەکتر بەناحەق مەکوژن، کاتێک بێزاریی و بێتاقەتی رووتان تێدەکات یان تووشی زیانێک دەبن)، بەڕاستی خوا میهرەبانە پێتان.

(٣٠) هەر کەسێکیش کاری وابکات (سامانی خەڵکی بەناحەق بخوات یان خۆی یان خەڵک بکوژێت) بەدوژمنایەتی و ستەمکردن، ئەوە لە ئایندەدا دەیخەینە دۆزەخەوە و بەئاگر دەیسووتێنین، ئەو کارەش بۆ خوا هەمیشە و بەردەوام ئاسانە.

(٣١) ئەگەر خۆتان بپارێزن لەو تاوانە گەورانەی قەدەغە کراوە لێتان، ئەوە لە گوناهەکانی ترتان چاوپۆشی دەکەین و دەتانخەینە جێیەکی خۆش و سازگارو ڕێزدارەوە (کە بەهەشتی بەرینە).

(٣٢) ئاواتەخوازی شتێک مەکەن کە خوا بەخشیویەتی بەهەندێکتان و (نەیبەخشیووە بەهەندێکتان، چونکە خوا دادپەروەرە و یاساکانی لە رووی زانستی و حیکمەتەوەیە، کاتێک هەندێک مافی داوە بەپیاوان، لە هەندێک رووی تریشەوە مافی داوە بەئافرەتان... هتد) پیاوان، بەشێکان هەیە لەوەی کە بەدەستیان هێناوە، هەروەها ئافرەتانیش بەشێکیان هەیە لەوەی کە بەدەستیان هێناوە، هەمیشە و بەردەوامیش داوای زیادە بەخشش و بەهرەی خوا بکەن، چونکە بەڕاستی خوا بەهەموو شتێک زانایە.

(٣٣) بۆ هەموو کەسێک و هەموو سامانێک چەند میراتبەرێکمان داناوە لەوەی کە لە دایک و باوک وخزمان بەجیٚ ماوە (تا بەدادپەروەریی وەکو دیاریکراوە دابەشی بکەن) و بۆ ئەوانەش کە پەیمانتان لەگەڵ بەستوون کەوا میرات لەیەکتر بگرن، مافی ئەوانیش بدەن، بەڕاستی خوا هەمیشەو بەردەوام شایەتێکی ئاگادارە بەسەر هەموو شتێکدا.

ٱلرِّجَالُ قَوَّٰمُونَ عَلَى ٱلنِّسَآءِ بِمَا فَضَّلَ ٱللَّهُ بَعۡضَهُمۡ
عَلَىٰ بَعۡضٖ وَبِمَآ أَنفَقُواْ مِنۡ أَمۡوَٰلِهِمۡۚ فَٱلصَّٰلِحَٰتُ
قَٰنِتَٰتٌ حَٰفِظَٰتٞ لِّلۡغَيۡبِ بِمَا حَفِظَ ٱللَّهُۚ وَٱلَّٰتِي تَخَافُونَ
نُشُوزَهُنَّ فَعِظُوهُنَّ وَٱهۡجُرُوهُنَّ فِي ٱلۡمَضَاجِعِ
وَٱضۡرِبُوهُنَّۖ فَإِنۡ أَطَعۡنَكُمۡ فَلَا تَبۡغُواْ عَلَيۡهِنَّ سَبِيلًاۗ
إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلِيّٗا كَبِيرٗا ﴿٣٤﴾ وَإِنۡ خِفۡتُمۡ شِقَاقَ
بَيۡنِهِمَا فَٱبۡعَثُواْ حَكَمٗا مِّنۡ أَهۡلِهِۦ وَحَكَمٗا مِّنۡ أَهۡلِهَآ إِن
يُرِيدَآ إِصۡلَٰحٗا يُوَفِّقِ ٱللَّهُ بَيۡنَهُمَآۗ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلِيمًا خَبِيرٗا
﴿٣٥﴾ ۞ وَٱعۡبُدُواْ ٱللَّهَ وَلَا تُشۡرِكُواْ بِهِۦ شَيۡـٔٗاۖ وَبِٱلۡوَٰلِدَيۡنِ
إِحۡسَٰنٗا وَبِذِي ٱلۡقُرۡبَىٰ وَٱلۡيَتَٰمَىٰ وَٱلۡمَسَٰكِينِ وَٱلۡجَارِ
ذِي ٱلۡقُرۡبَىٰ وَٱلۡجَارِ ٱلۡجُنُبِ وَٱلصَّاحِبِ بِٱلۡجَنۢبِ
وَٱبۡنِ ٱلسَّبِيلِ وَمَا مَلَكَتۡ أَيۡمَٰنُكُمۡۗ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ مَن
كَانَ مُخۡتَالٗا فَخُورًا ﴿٣٦﴾ ٱلَّذِينَ يَبۡخَلُونَ وَيَأۡمُرُونَ
ٱلنَّاسَ بِٱلۡبُخۡلِ وَيَكۡتُمُونَ مَآ ءَاتَىٰهُمُ ٱللَّهُ
مِن فَضۡلِهِۦۗ وَأَعۡتَدۡنَا لِلۡكَٰفِرِينَ عَذَابٗا مُّهِينٗا ﴿٣٧﴾



(٣٤) پیاوان سەرپەرشتیارن بەسەر هاوسەرەکانیانەوە، ئەمەش بەهۆی ڕێزو زیادە ئەرکێکەوە کە خوا داویەتی بەهەندێک بەسەر هەندێکی تردا (سەرەڕای ئەوەی کە) پیاوان لەماڵ و سامانیان خەرج دەکەن (لەپێناوی ئاسوودەیی و خۆشگوزەرانی ئافرەتاندا)، لەولاشەوە ئافرەتانی ژیرو دیندارو گونجاو هەمیشە گوێرایەڵی مێردەکانیانن، نهێنی نێوان خۆیان و مێردەکانیان دەپارێزن (بەتایبەت ئەو نهێنیانەی خوا دەیەوێت پارێزراو بن) بەهۆی ئەوەی کە خوا مافەکانی ئەوانی پاراستووە، ئەو ئافرەتانەش ئێوە دەترسن سەرکەشی وسەرپێچی بکەن سەرەتا ئامۆژگاریان بکەن،(ئەگەر سوودی نەبوو) لەناو جێدا پشتیان تێبکەن، (ئەگەر ئەوەش سوودی نەبوو) لێیان بدەن (بەمەرجێک لێدانەکە لە دەم و چاو نەبێت و ئاسەوار بەجێنەهێڵێت)، ئەگەر بەم هۆیانە لە لادان و یاخی بوون وازیان هێنا، ئەوە ئیتر ستەمیان لێمەکەن و ڕێگەی تر مەگرنەبەر (بۆ ئازاردانیان) بێگومان خوا بەرزو بڵندو گەورەیە، (ئەگەر ستەمیان لێبکەن تۆڵەتان لێدەسێنێت).

(٣٥) خۆ ئەگەر ترسان لەوەی نێوان ژن و مێرد بشێوێت (کێشەیان چارەسەر نەکرێت)، دادوەرێک لە خزمی پیاوەکە و دادوەرێک لە خزمی ژنەکە بنێرن (بۆ ڕێکخستنیان) ئەگەر چاکسازی و ڕێکخستنیان بوێت، ئەوە خوا پێکهاتن فەراهەم دەهێنێت لە نێوان ژن و مێردەکەدا، بێگومان خوا هەمیشەو بەردەوام زاناو ئاگایە.

(٣٦) (ئەی خەڵکینە) تەنها خوا بپەرستن و هیچ جۆرە شەریک و هاوەڵێکی بۆ بڕیار مەدەن و چاکەکار بن لەگەڵ دایک و باوکتان و خزمان و هەتیوان و هەژاران و دراوسێی خزم و دراوسێی نزیک و دراوسێی بێگانەداو هاوەڵی کارو سەفەرو ڕێبوارو ژێر دەستەکانتاندا، بەڕاستی خوا ئەوانەی خۆش ناوێت کە خۆدەنوێنن و فیزدەکەن و فەخر دەفرۆشن بەسەر خەڵکیدا.

(٣٧) ئەوانەی ڕەزیلی دەکەن و فەرمان دەدەن بەخەڵکی کە ڕەزیل بن و ئەو شتانەی خوا لە زیادە فەزڵی خۆی پێی بەخشیوون (لە ماڵ و سامان و زانستی) دەیشارنەوە و (نایەڵن کەس سوودی لێوەربگرێت، با ئەوە بزانن) کە ئێمە بۆ خوانەناسان سزایەکی سەرشۆڕکەرمان ئامادە کردووە.

وَالَّذِينَ يُنفِقُونَ أَمْوَالَهُمْ رِئَاءَ النَّاسِ وَلَا يُؤْمِنُونَ
بِاللَّهِ وَلَا بِالْيَوْمِ الْآخِرِ وَمَن يَكُنِ الشَّيْطَانُ لَهُ قَرِينًا فَسَاءَ
قَرِينًا ﴿٣٨﴾ وَمَاذَا عَلَيْهِمْ لَوْ آمَنُوا بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ وَأَنفَقُوا
مِمَّا رَزَقَهُمُ اللَّهُ وَكَانَ اللَّهُ بِهِمْ عَلِيمًا ﴿٣٩﴾ إِنَّ اللَّهَ لَا يَظْلِمُ
مِثْقَالَ ذَرَّةٍ وَإِن تَكُ حَسَنَةً يُضَاعِفْهَا وَيُؤْتِ مِن لَّدُنْهُ
أَجْرًا عَظِيمًا ﴿٤٠﴾ فَكَيْفَ إِذَا جِئْنَا مِن كُلِّ أُمَّةٍ بِشَهِيدٍ
وَجِئْنَا بِكَ عَلَىٰ هَٰؤُلَاءِ شَهِيدًا ﴿٤١﴾ يَوْمَئِذٍ يَوَدُّ الَّذِينَ
كَفَرُوا وَعَصَوُا الرَّسُولَ لَوْ تُسَوَّىٰ بِهِمُ الْأَرْضُ وَلَا يَكْتُمُونَ
اللَّهَ حَدِيثًا ﴿٤٢﴾ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تَقْرَبُوا الصَّلَاةَ
وَأَنتُمْ سُكَارَىٰ حَتَّىٰ تَعْلَمُوا مَا تَقُولُونَ وَلَا جُنُبًا إِلَّا عَابِرِي
سَبِيلٍ حَتَّىٰ تَغْتَسِلُوا وَإِن كُنتُم مَّرْضَىٰ أَوْ عَلَىٰ سَفَرٍ أَوْ جَاءَ
أَحَدٌ مِّنكُم مِّنَ الْغَائِطِ أَوْ لَامَسْتُمُ النِّسَاءَ فَلَمْ تَجِدُوا مَاءً
فَتَيَمَّمُوا صَعِيدًا طَيِّبًا فَامْسَحُوا بِوُجُوهِكُمْ وَأَيْدِيكُمْ إِنَّ
اللَّهَ كَانَ عَفُوًّا غَفُورًا ﴿٤٣﴾ أَلَمْ تَرَ إِلَى الَّذِينَ أُوتُوا نَصِيبًا مِّنَ
الْكِتَابِ يَشْتَرُونَ الضَّلَالَةَ وَيُرِيدُونَ أَن تَضِلُّوا السَّبِيلَ ﴿٤٤﴾

(٣٨) ئەوانەش کە ماڵ و سامانیان بۆ رووپامایی خەڵکی دەبەخشن، باوەڕناهێنن نە بە خوا، نە بەرۆژی دوایی (دیارە کە شەیتان ئەوانی لە خشتە بردووە و کردوونی بەهاوەڵی خۆی) جا ئەوەی شەیتان بکاتە هاوەڵ و هاودەمی خۆی (مەگەر خوا بزانێت) چ ناپوخت و نالەبارێکی کردۆتە هاوەڵی خۆی.

(٣٩) چ زیانێکیان لێدەکەوت؟ چیان بەسەر دەهات؟ (ئەو خەڵکە) ئەگەر باوەڕیان بە خواو رۆژی دوایی بهێنایە و لەو رزق و رۆزیەی کە خوا پێی بەخشیوون بیانبەخشیایە (جگە لە سود و قازانجی بێسنوور لە هەردوو دنیادا) خۆ خوا هەمیشەو بەردەوام ئاگای لێیانەو زانیاری هەیە دەربارەیان.

(٤٠) بەڕاستی خوا بەقەدەر تۆزقاڵێک ستەم (لە ئادەمیزاد) ناکات، خۆ ئەگەر چاکەیەک هەبێت (بەرەکەتی بەسەردا دەڕێژێت و) چەند بەرابەری دەکات و لەلایەن خۆیەوە پاداشتی گەورەو بێسنوور دەبەخشێت (بە چاکە خوازان).

(٤١) ئینجا دەبێت حاڵی ئەو خەڵکە چۆن بێت کاتێک لە هەر میللەتێک شایەتێکمان هێنا و تۆشمان هێنا (ئەی محمد ﷺ) بەشایەت بەسەر ئەو خەڵکەوە (کە پەیامی خوات پێڕاگەیاندوون).

(٤٢) ئەو رۆژە ئەوانەی بێ باوەڕ بوون و لە پێغەمبەر یاخی بوون، ئاواتەخوازن کە زەوییان پێ تەخت بکرایەو (هەر لەتوێی خاکدا ون بوونایەو زیندوو نەکرانایەتەوە) و ناتوانن هیچ گوفتارێکی پەنهانیان لە خوا بشارنەوە.

(٤٣) ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە نزیکی نوێژ مەکەون لەکاتێکدا ئێوە سەرخۆشن ـ ئەمە کاتێک بوو هێشتا عەرەق و شەراب حەرام نەکرابوو ـ هەتا ئاسەواری سەرخۆشیی نامێنێت و دەزانن چی دەڵێن (لە نوێژەکەدا) و بە لەشی بێ نوێژیشەوە نوێژ مەکەن مەگەر رێبوار بن و لە سەفەردا بن، هەتا خۆتان دەشۆن، خۆ ئەگەر نەخۆش بوون یان لە سەفەردا بوون یان لەسەرئاو گەڕانەوە، یان لەگەڵ ئافرەتانی نامەحرەم لە یەککەون و ئاوتان دەست نەدەکەوت (بۆ خۆشتن و دەست نوێژ گرتن) ئەوا تەیەموم بکەن بەخاکێکی پاک و(بەو خاکە) دەست بهێنن بەسەر دەم و چاوو دەستاندا، بێگومان خوا هەمیشە و بەردەوام لێ خۆشبووەو گوزەشت و چاوپۆشی هەیە.

(٤٤) ئایا نەتڕوانیووەتە ئەوانەی کە شارەزایی هەندێک لە کتێبە ئاسمانیەکانیان دراوەتێ، ئەوانە گومڕایی دەکڕن و دەیانەوێت ئێوەش گومڕاو سەرلێشێواو بن.

وَٱللَّهُ أَعْلَمُ بِأَعْدَآئِكُمْ ۚ وَكَفَىٰ بِٱللَّهِ وَلِيًّا وَكَفَىٰ بِٱللَّهِ نَصِيرًا ﴿٤٥﴾ مِّنَ ٱلَّذِينَ هَادُوا۟ يُحَرِّفُونَ ٱلْكَلِمَ عَن مَّوَاضِعِهِۦ وَيَقُولُونَ سَمِعْنَا وَعَصَيْنَا وَٱسْمَعْ غَيْرَ مُسْمَعٍ وَرَٰعِنَا لَيًّۢا بِأَلْسِنَتِهِمْ وَطَعْنًا فِى ٱلدِّينِ ۚ وَلَوْ أَنَّهُمْ قَالُوا۟ سَمِعْنَا وَأَطَعْنَا وَٱسْمَعْ وَٱنظُرْنَا لَكَانَ خَيْرًا لَّهُمْ وَأَقْوَمَ وَلَٰكِن لَّعَنَهُمُ ٱللَّهُ بِكُفْرِهِمْ فَلَا يُؤْمِنُونَ إِلَّا قَلِيلًا ﴿٤٦﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْكِتَٰبَ ءَامِنُوا۟ بِمَا نَزَّلْنَا مُصَدِّقًا لِّمَا مَعَكُم مِّن قَبْلِ أَن نَّطْمِسَ وُجُوهًا فَنَرُدَّهَا عَلَىٰٓ أَدْبَارِهَآ أَوْ نَلْعَنَهُمْ كَمَا لَعَنَّآ أَصْحَٰبَ ٱلسَّبْتِ ۚ وَكَانَ أَمْرُ ٱللَّهِ مَفْعُولًا ﴿٤٧﴾ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَغْفِرُ أَن يُشْرَكَ بِهِۦ وَيَغْفِرُ مَا دُونَ ذَٰلِكَ لِمَن يَشَآءُ ۚ وَمَن يُشْرِكْ بِٱللَّهِ فَقَدِ ٱفْتَرَىٰٓ إِثْمًا عَظِيمًا ﴿٤٨﴾ أَلَمْ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ يُزَكُّونَ أَنفُسَهُم ۚ بَلِ ٱللَّهُ يُزَكِّى مَن يَشَآءُ وَلَا يُظْلَمُونَ فَتِيلًا ﴿٤٩﴾ ٱنظُرْ كَيْفَ يَفْتَرُونَ عَلَى ٱللَّهِ ٱلْكَذِبَ ۖ وَكَفَىٰ بِهِۦٓ إِثْمًا مُّبِينًا ﴿٥٠﴾ أَلَمْ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ نَصِيبًا مِّنَ ٱلْكِتَٰبِ يُؤْمِنُونَ بِٱلْجِبْتِ وَٱلطَّٰغُوتِ وَيَقُولُونَ لِلَّذِينَ كَفَرُوا۟ هَٰٓؤُلَآءِ أَهْدَىٰ مِنَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ سَبِيلًا ﴿٥١﴾

(٤٥) خـوای گـەورەش چـاک دوژمنـەکانتان دەناسێت، جا تەنـها خـوا بەسـە کـە یـارو یـاوەر بێت و تەنها خوا بەسە پشتیوان بێت.

(٤٦) هـەنـدێـک لـەوانـەی کـە بـوونـەتـە جـوو قـسـە لـەجێی خـۆیـدا دەسکاریـی دەکـەن و جێ گـۆرکێی پێـدەکـەن و بـەئـارەزووی خـۆیان لێکـی دەدەنـەوە (بـەکـیـنـەوگـاڵتـەوە) دەڵێـن: بیستمان و بەقسەشمان نەکردیت!! گـوێ بگـرە دەک گوێـت لـێ نـەبێت!! (هـەروەها دەیـان وت:) (راعنا) و دەمیان بۆ خوار دەکردەوە تـا مـانایـەکی هەڵـە ببەخشێت و ببێتـە تەعنـە و رەخنـە لـە دیـن، خۆ ئەگـەر بەراسـتی ئـەوان بیانوتایە: بیستمان وگوێڕایەڵین و تۆیش گوێمـان بۆ بگرەو مۆڵەتمان بـدە(تـا تێبگـەین) چاکترو راسترو بەنرختر بوو بۆیان، بەڵام (چونکـە پـاک نـین و دەروون نەخۆشـن) خـوا نـەفرەتی لـێ کـردوون بـەهۆی کوفریانـەوە، بۆیـە باوەڕنـاهێنن کەمێک نەبێت.

(٤٧) ئـەی ئـەوانـەی کـتـێـبتان پـێ بەخشـراوە باوەڕ بهێنن بەو (قورئانەی) کـە نـاردوومانـەو بـەراسـت دانـەری ئـەوەی ئـێـوەیـە، پێـش ئـەوەی (رۆژێـک بێـت) کـە رووخسـارانێکی (بێ دیـن) پـان و پلیش بکەینـەوە و ناسـەواری دەم و چاو نەیەڵین و بەرەو پشتی بکەین و وەکو پشـتـی سـەری لێبکـەین، یـاخود نـەفرینیان لێبکەین وەکو چۆن نەفرینمان لە خەڵکانی رۆژانی شەمموان کـرد (ئەوانـەی کـە بـەفێڵ راوە ماسیان کـردو فـەرمانی خوایان شکاند)، بێگومان هەر فەرمانی خوایە کە هەمیشەو بەردەوام ئەنجام دراوە.

(٤٨) بەراستی خوا خۆش نابێت ئەگەر هاوەڵی بۆ بڕیار بدرێت، بێجگە لەوە لـە هـەر گوناهێکی تـر بیـەوێت خۆش دەبێت، بۆ ئەو کەسەی کە دەیەوێت، جا ئەوەی هاوەڵ و شەریک بۆ خوا بڕیار بدات، ئـەوە ئیتر بەراسـتی تـاوانێکی گەورەی هەڵبەستووە.

(٤٩) ئایا نەتڕوانیووەتە ئەو کەسانەی خۆیان خۆیان بە چاک دەدەنە قەڵەم (دەڵێن ئێمە هەڵبژاردەی خواین) ئـەوە وا نیە، بەڵکو خوا (بەندەکانی دەناسێت)و هەرکەس (شایستە بێت، پەسەندی دەکات)و دڵ و دەروونی خاوێن دەکات و ئەوانە بە قەدەر تاڵی ناوکی خورما ستەمیان لێ ناکرێت.

(٥٠) سەرنج بدەو تەماشا بکە چۆن (خاوەنانی کتێبی ئاسمانی) درۆ بە دەم خواوە دەکەن (بێباکانە دەڵێن: عوزەیـر یان مەسیح کوڕی خوان) ئەو تاوان و گوناهەیان بەسە (بۆ سزادانیان چونکە تاوانێکی زۆر گەورە)ی ئاشکرایە.

(٥١) ئایا نەتڕوانیووەتە ئەوانەی کە بەشێک لە کتێبی ئاسمانی پێدراوە (کەچی لەگەڵ ئەوەشدا) باوەڕیان بـەفاڵچی و جادووگەرو بت و پەیکەرو شەیتان و ...هەیە و دەربارەی ئەوانـەی کـە بێباوەڕن دەڵێـن: ئەوانـە چاکترن و رێبـازی راستتریان گرتووە، تا ئەوانەی کە ئیمان و باوەڕیان (بەئاینی ئیسلام هێناوە).

أُولَٰئِكَ الَّذِينَ لَعَنَهُمُ اللَّهُ ۖ وَمَن يَلْعَنِ اللَّهُ فَلَن تَجِدَ لَهُ نَصِيرًا ﴿٥٢﴾
أَمْ لَهُمْ نَصِيبٌ مِّنَ الْمُلْكِ فَإِذًا لَّا يُؤْتُونَ النَّاسَ نَقِيرًا ﴿٥٣﴾ أَمْ
يَحْسُدُونَ النَّاسَ عَلَىٰ مَا آتَاهُمُ اللَّهُ مِن فَضْلِهِ ۖ فَقَدْ آتَيْنَا
آلَ إِبْرَاهِيمَ الْكِتَابَ وَالْحِكْمَةَ وَآتَيْنَاهُم مُّلْكًا عَظِيمًا ﴿٥٤﴾
فَمِنْهُم مَّنْ آمَنَ بِهِ وَمِنْهُم مَّن صَدَّ عَنْهُ ۚ وَكَفَىٰ بِجَهَنَّمَ سَعِيرًا
﴿٥٥﴾ إِنَّ الَّذِينَ كَفَرُوا بِآيَاتِنَا سَوْفَ نُصْلِيهِمْ نَارًا كُلَّمَا نَضِجَتْ
جُلُودُهُم بَدَّلْنَاهُمْ جُلُودًا غَيْرَهَا لِيَذُوقُوا الْعَذَابَ ۗ إِنَّ اللَّهَ
كَانَ عَزِيزًا حَكِيمًا ﴿٥٦﴾ وَالَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ
سَنُدْخِلُهُمْ جَنَّاتٍ تَجْرِي مِن تَحْتِهَا الْأَنْهَارُ خَالِدِينَ فِيهَا أَبَدًا ۖ
لَّهُمْ فِيهَا أَزْوَاجٌ مُّطَهَّرَةٌ ۖ وَنُدْخِلُهُمْ ظِلًّا ظَلِيلًا ﴿٥٧﴾ ۞ إِنَّ
اللَّهَ يَأْمُرُكُمْ أَن تُؤَدُّوا الْأَمَانَاتِ إِلَىٰ أَهْلِهَا وَإِذَا حَكَمْتُم بَيْنَ
النَّاسِ أَن تَحْكُمُوا بِالْعَدْلِ ۚ إِنَّ اللَّهَ نِعِمَّا يَعِظُكُم بِهِ ۗ إِنَّ اللَّهَ كَانَ سَمِيعًا
بَصِيرًا ﴿٥٨﴾ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا أَطِيعُوا اللَّهَ وَأَطِيعُوا الرَّسُولَ وَأُولِي
الْأَمْرِ مِنكُمْ ۖ فَإِن تَنَازَعْتُمْ فِي شَيْءٍ فَرُدُّوهُ إِلَى اللَّهِ وَالرَّسُولِ إِن كُنتُمْ
تُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ ۚ ذَٰلِكَ خَيْرٌ وَأَحْسَنُ تَأْوِيلًا ﴿٥٩﴾



(٥٢) ئەو (جوولەکانە) کەسانێکن خوا نەفرینی لێکردوون، کەسێکیش خوا نەفرینی لێ بکات، ئەوە هەرگیز هیچ کەست دەست ناکەوێت بیکەیتە پشتیوانی.

(٥٣) مەگەر ئەوانە هەندێک دەسەڵاتیان بەدەستە، تا ئەوکاتە بەقەدەر تۆزقاڵێک لە ناوکی خورما بەخەڵکی نەدەن؟!

(٥٤) یان هەر ئەوەیە کە حەسادەت و بەخیلی بەخەڵکی (ئیماندار) دەبەن لەسەر ئەوەی خوا لە فەزڵ و بەخششی خۆی بەشی داون (پێغەمبەری لەناویاندا هەڵبژاردووە) خۆ بێگومان ئێمە بەنەوەی ئیبراهیم کتێبمان بەخشیووە (بە موسا تەورات و بە عیسا ئینجیل و بە محەمەدیش ﷺ قورئان) هەروەها لەجۆرەها دانایی بەهرەوەرمان کردوون و (بە هەندێکیان) وەک (یوسف و داود و سولەیمان) دەسەڵات و پاشایەتیەکی گەورەمان بەخشیووە.

(٥٥) جا لەوخەڵکە هەیە باوەڕیان بە (محمد ﷺ و بە قورئان) هێناوەو شوێنی کەوتوون، هەشیانە ڕێی لێگرتووە و پشتی تێکردووە، دۆزەخیش بەسە (بۆ ئەو یاخییانە) کە ئامادەیە و کڵپەی سەندووە.

(٥٦) بەڕاستی ئەوانەی باوەڕیان نەهێناوە بە ئایەت و فەرمانەکانی ئێمە، لە ئایندەدا دەیانسوتێنین بەئاگری دۆزەخ، هەموو جارێک پێستیان داوشاو سووتاو هەڵقرچا، پێستی تر دەکەین بەبەریاندا، بۆ ئەوەی بە چاکی سزاو ئازار بچەژن، بەڕاستی خوا هەمیشەو بەردەوام باڵادەستە و (دەتوانێت تۆڵە لە خوانەناسان بسەنێت)، دانایە (کە مۆڵەتیان دەدات بەڵکو بگەڕێنەوە بۆ ڕێبازی دینداری).

(٥٧) ئەوانەش کە باوەڕیان هێناوەو کارو کردەوەی چاکە ئەنجام دەدەن لەئایندەیەکی نزیکدا دەیانخەینە ناو باخەکانی بەهەشتەوە کە چەندەها رووبار (بەژێر درەختەکانیداو بە بەردەم کۆشکەکانیدا) دەڕوات و لەوێدا ژیانی هەمیشەیی و بەردەوام دەبەنە سەر، هاوڕێ لەگەڵ چەندەها هاوسەری پاک و بێگەردو خاوێن و پاکیزەدا، هەروەها دەیانخەینە ژێر سایەی سێبەری جوان و ڕازاوەی هەمیشەییەوە (نە گەرمایان دەبێت، نە سەرما).

(٥٨) بێگومان خوا فەرمانتان پێدەدات کە هەموو ئەمانەتەکان (سپاردەکان) بگەڕێننەوە دەست خاوەنەکانیان و هەر کاتێکیش داوەریتان کرد لەنێوان خەڵکیدا، دادپەروەرانە فەرمانڕەوایی بکەن، چونکە بەڕاستی خوا بەجوانی و چاکی و تەواوی ئامۆژگاری و فەرمانتان پێدەدات، بەڕاستی خوا هەمیشەو بەردەوام بیسەر و بینایە.

(٥٩) ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە، فەرمانبەردارو گوێڕایەڵی خواو پێغەمبەرو فەرمانڕەواکان بکەن کە لە خودی خۆتانن (لە بیروباوەڕو پابەندیدا)، خۆ ئەگەر لە شتێکدا بوو بەکێشەتان دەربارەی حوکمی خوایی، ئەوە ئەو کێشەیە بگێڕنەوە بۆ لای خواو پێغەمبەرەکەی ﷺ (کە قورئان و سوننەت دەگەیەنێت)، ئەگەر ئێوە باوەڕتان بەخواو بە ڕۆژی قیامەت هەیە، (ڕەفتارکردنتان) بەو شێوەیە چاکترین و جوانترین سەرچاوەیە بۆ چارەسەری کێشەکانتان.

أَلَمْ تَرَ إِلَى الَّذِينَ يَزْعُمُونَ أَنَّهُمْ آمَنُوا بِمَا أُنْزِلَ إِلَيْكَ وَمَا أُنْزِلَ مِنْ قَبْلِكَ يُرِيدُونَ أَنْ يَتَحَاكَمُوا إِلَى الطَّاغُوتِ وَقَدْ أُمِرُوا أَنْ يَكْفُرُوا بِهِ وَيُرِيدُ الشَّيْطَانُ أَنْ يُضِلَّهُمْ ضَلَالًا بَعِيدًا ﴿٦٠﴾ وَإِذَا قِيلَ لَهُمْ تَعَالَوْا إِلَى مَا أَنْزَلَ اللَّهُ وَإِلَى الرَّسُولِ رَأَيْتَ الْمُنَافِقِينَ يَصُدُّونَ عَنْكَ صُدُودًا ﴿٦١﴾ فَكَيْفَ إِذَا أَصَابَتْهُمْ مُصِيبَةٌ بِمَا قَدَّمَتْ أَيْدِيهِمْ ثُمَّ جَاءُوكَ يَحْلِفُونَ بِاللَّهِ إِنْ أَرَدْنَا إِلَّا إِحْسَانًا وَتَوْفِيقًا ﴿٦٢﴾ أُولَئِكَ الَّذِينَ يَعْلَمُ اللَّهُ مَا فِي قُلُوبِهِمْ فَأَعْرِضْ عَنْهُمْ وَعِظْهُمْ وَقُلْ لَهُمْ فِي أَنْفُسِهِمْ قَوْلًا بَلِيغًا ﴿٦٣﴾ وَمَا أَرْسَلْنَا مِنْ رَسُولٍ إِلَّا لِيُطَاعَ بِإِذْنِ اللَّهِ وَلَوْ أَنَّهُمْ إِذْ ظَلَمُوا أَنْفُسَهُمْ جَاءُوكَ فَاسْتَغْفَرُوا اللَّهَ وَاسْتَغْفَرَ لَهُمُ الرَّسُولُ لَوَجَدُوا اللَّهَ تَوَّابًا رَحِيمًا ﴿٦٤﴾ فَلَا وَرَبِّكَ لَا يُؤْمِنُونَ حَتَّى يُحَكِّمُوكَ فِيمَا شَجَرَ بَيْنَهُمْ ثُمَّ لَا يَجِدُوا فِي أَنْفُسِهِمْ حَرَجًا مِمَّا قَضَيْتَ وَيُسَلِّمُوا تَسْلِيمًا ﴿٦٥﴾

(٦٠) ئایا نەتڕوانیووەتـە ئـەو (دووڕووانـەی) لافی ئەوە لێ دەدەن گوایە بەڕاستی باوەڕیان هێناوە بـەوەی کە بـۆ تـۆ ڕەوانـەکراوە و بـەوەش کـە پێش تـۆ ڕەوانـەکراوە (بـۆ پێغـەمـبـەران)! کـەچی دەیانـەوێت ڕوویکەنـە زۆردارو جادووگەرو خوانەناسان تا دادوەریان لە نێواندا بکەن و چارەسەری کێشەکانیان بکەن، لەکاتێکدا بـە ڕاستی فـەرمانیان پێدراوە کـە باوەڕیان بە (طــاغوت) نـەبێت، شـەیتانیش دەیەوێت گومڕایان بکات بەگومڕاییەکی دوورو بێسنوور.

(٦١) کاتێکیش پێیان بوترێ: وەرن بۆ لای ئەو (قورئانەی) کە خـوا ناردوویەتیـە خـوارەوە و بـۆ لای پێغەمبەرەکـەی(بـۆ چارەسـەری کێشەکانتان) کەچی دەبینی دووڕووەکان پشتت تێدەکەن و ڕووت لێ وەردەگێڕن بەتەواوی.

(٦٢) ئاخۆ ئەوانە حاڵیـان چـۆن بێـت کـاتێـک بـەهۆی ڕەفتـاری نادروسـتیانەوە بەڵایـەک دووچاریـان دەبێـت، کـەچی لـەوەودوا (کـە پـەنایـان نـامێنێت) هـاوار بـۆ تـۆ دەهێنـن و سوێند بەخوا دەخۆن: لەو کـارەمـانـدا مـەبەستمان تـەنـها چاکـەکـاریـی و ڕێـکـخستن و تـاشتی بوو.

(٦٣) ئا ئەوانە کەسانێکن خوا دەزانێت چی لە دڵ و دەروونیاندا حەشاردراوە، کەواتە ڕەفتاری ئەوانـە پشـتگوێ بخە ئامۆژگاریان بکە و قسەی بەپێزو بەتوێکڵی وایـان پـێ بڵـێ کـە بـەقوڵایی دەروونیـانـدا بچێتـە خـوارەوە و بیانهەژێنێت.

(٦٤) هیچ فرستادەیەکمان نەناردوە مەگەر تەنها بۆ ئەوەی گوێڕایەڵی بکرێـت بـەفرمانی خوا، خۆ ئەگـەر ئـەو خەڵکە بەڕاستی کـاتێک ستـەمیان لـە خۆیـان کـرد (بـە لادان لـە شـەریعەت) بهاتنایـە بـۆ لای تـۆ و داوای لێخۆشبوونیان لە خوای گەورە بکردایە، پێغەمبەریش داوای لێخۆشبوونی بۆ بکردنایە، ئەوە بێگومـان ئـەو کاتـە دەیانزانی کە خوا تەوبە و پەشیمانی وەرگرەو میهرەبان و دلۆڤانە (ئەگەر بەڕاستیان بوایە).

(٦٥) نەخێر، سوێند بە پەروەردگارت ئەوانەی (لافی بڕوا لێدەدەن) بڕوا ناهێنن هەتا لە هەموو کێشەیەکدا کە ڕوودەدا لە نێوانیاندا تۆ نەکەن بە دادوەرو گوێڕایەڵی تۆ نەکەن، دوای ئـەوەش نـابێت لـە دڵ و دەروونیـانـدا هیـچ ناڕەزاییەک دروست ببێت بەرامبەر ئەوەی کە داوەریت لەسەر کردووە و دەبێت بەتەواویی تەسلیم بن و ڕازیی بن.

وَلَوْ أَنَّا كَتَبْنَا عَلَيْهِمْ أَنِ اقْتُلُوا أَنفُسَكُمْ أَوِ اخْرُجُوا مِن دِيَارِكُم مَّا فَعَلُوهُ إِلَّا قَلِيلٌ مِّنْهُمْ وَلَوْ أَنَّهُمْ فَعَلُوا مَا يُوعَظُونَ بِهِ لَكَانَ خَيْرًا لَّهُمْ وَأَشَدَّ تَثْبِيتًا ﴿٦٦﴾ وَإِذًا لَّآتَيْنَاهُم مِّن لَّدُنَّا أَجْرًا عَظِيمًا ﴿٦٧﴾ وَلَهَدَيْنَاهُمْ صِرَاطًا مُّسْتَقِيمًا ﴿٦٨﴾ وَمَن يُطِعِ اللَّهَ وَالرَّسُولَ فَأُولَٰئِكَ مَعَ الَّذِينَ أَنْعَمَ اللَّهُ عَلَيْهِم مِّنَ النَّبِيِّينَ وَالصِّدِّيقِينَ وَالشُّهَدَاءِ وَالصَّالِحِينَ وَحَسُنَ أُولَٰئِكَ رَفِيقًا ﴿٦٩﴾ ذَٰلِكَ الْفَضْلُ مِنَ اللَّهِ وَكَفَىٰ بِاللَّهِ عَلِيمًا ﴿٧٠﴾ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا خُذُوا حِذْرَكُمْ فَانفِرُوا ثُبَاتٍ أَوِ انفِرُوا جَمِيعًا ﴿٧١﴾ وَإِنَّ مِنكُمْ لَمَن لَّيُبَطِّئَنَّ فَإِنْ أَصَابَتْكُم مُّصِيبَةٌ قَالَ قَدْ أَنْعَمَ اللَّهُ عَلَيَّ إِذْ لَمْ أَكُن مَّعَهُمْ شَهِيدًا ﴿٧٢﴾ وَلَئِنْ أَصَابَكُمْ فَضْلٌ مِّنَ اللَّهِ لَيَقُولَنَّ كَأَن لَّمْ تَكُن بَيْنَكُمْ وَبَيْنَهُ مَوَدَّةٌ يَا لَيْتَنِي كُنتُ مَعَهُمْ فَأَفُوزَ فَوْزًا عَظِيمًا ﴿٧٣﴾ ۞ فَلْيُقَاتِلْ فِي سَبِيلِ اللَّهِ الَّذِينَ يَشْرُونَ الْحَيَاةَ الدُّنْيَا بِالْآخِرَةِ وَمَن يُقَاتِلْ فِي سَبِيلِ اللَّهِ فَيُقْتَلْ أَوْ يَغْلِبْ فَسَوْفَ نُؤْتِيهِ أَجْرًا عَظِيمًا ﴿٧٤﴾



(٦٦) خۆ ئەگەر بەڕاستی ئێمە پێویستمان بکردایە لەسەریان کە خۆتان بکوژن، یان لە وڵات و نیشتمانتان دەرچن ئەوەیان نەدەکرد، مەگەر کەمێکیان نەبێت (چونکە بەجێ هێنانی فرمانی خوا بەبێ چەن و چوون پیشەی بەندە راستەقینەکانە، ئێمەش ئەو داخوازیەمان لێ نەکردوون) جا ئەگەر بەڕاستی ئەوانە بەگوێرەی ئامۆژگاری و فرمانی ئێمە رەفتاریان بکردایە، ئەوە چاکتر بوو بۆیان و دامەزراوترو چەسپاوتر دەبوون لەسەر حەق و راستی.

(٦٧) جا ئەوکاتە بێگومان لەلایەن ئێمەوە پاداشتی گەورەو بێسنوورمان پێدەبەخشین...

(٦٨) بەتەواویش هیدایەت و رێنموویمان دەکردن بۆ رێگەو رێبازی راست و دروست.

(٦٩) ئەوەی فەرمانبەرداری خواو پێغەمبەر بکات، جا ئەوانە لەگەڵ ئەو کەسانەدا دەبن (لە بەهەشتی بەریندا) کەخوا نازونیعمەتی رژاندووە بەسەریاندا لەپێغەمبەران و راستگۆیان و شەهیدان و پیاوچاکان، ئای کە ئەوانە هاوەڵ و هاورێ و هاودەمێکی چاک و بێ وێنەن!

(٧٠) ئەو رێزو بەهرە گەورەیە هەر لەلایەن خواوەیە (بۆ ئەو بەختەوەرانە)، خوا خۆی بەسە کە زانایە بەهەموو شتێک.

(٧١) ئەی ئەوانەی کە باوەڕتان هێناوە ئەوەی خۆتانی پێدەپارێزن بیگرنە دەست و ئامادە باش بن، ئینجا دەستە دەستە یان هەمووتان یەک پارچە (بەرەو بەرەکانی جەنگ) هەڵمەت بەرن و هێرش ببەن. (هەرکاتێک لەلایەن سەرکردایەتیەکی متمانە پێکراوەوە داواتان لێکرا).

(٧٢) سوێند بێت (دەستەیەک دووڕوو هەن) لەناوتاندا بەڕاستی خۆیان دەخلافێنن و سستی دەکەن، جا ئەگەر بەڵایەکتان تووش بێت (هەریەک لەوانە) دەڵێت: بەڕاستی خوا چاکی بۆ کردم کە لەگەڵ ئەواندا ئامادەی (ئەو جەنگە) نەبووم.

(٧٣) سوێند بێت ئەگەر فەزڵ و دەستکەوتێکتان لەخواوە دەستکەوت بەڕاشکاوی دەڵێت ـ هەر وەک لەنێوان ئێوە و ئەو جۆرە کەسانەدا دۆستایەتی و ئاشنایەتی نەبوو بێت ـ خۆزگە لەگەڵ ئەواندا بوومایە و بۆ ئەوەی دەستکەوتێکی چاک و زۆر و زەبەندەم بەدەست بهێنایە.

(٧٤) دەبا بجەنگێت لە پێناوی خوادا، ئەوانەی ژیانی دنیا دەفرۆشن بەرۆژی دوایی، جا هەر کەس بجەنگێت لەپێناوی خوادا ئەوە ئەگەر بکوژرێت و شەهید ببێت، یان سەرکەوتن بەدەست بهێنێت، ئەوە لەئایندەدا پاداشتی گەورە و بێ سنووری پێدەبەخشین.

وَمَا لَكُمْ لَا تُقَٰتِلُونَ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ وَٱلْمُسْتَضْعَفِينَ مِنَ ٱلرِّجَالِ وَٱلنِّسَآءِ وَٱلْوِلْدَٰنِ ٱلَّذِينَ يَقُولُونَ رَبَّنَآ أَخْرِجْنَا مِنْ هَٰذِهِ ٱلْقَرْيَةِ ٱلظَّالِمِ أَهْلُهَا وَٱجْعَل لَّنَا مِن لَّدُنكَ وَلِيًّا وَٱجْعَل لَّنَا مِن لَّدُنكَ نَصِيرًا ﴿٧٥﴾ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ يُقَٰتِلُونَ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ ۖ وَٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ يُقَٰتِلُونَ فِي سَبِيلِ ٱلطَّٰغُوتِ فَقَٰتِلُوٓا۟ أَوْلِيَآءَ ٱلشَّيْطَٰنِ ۖ إِنَّ كَيْدَ ٱلشَّيْطَٰنِ كَانَ ضَعِيفًا ﴿٧٦﴾ أَلَمْ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ قِيلَ لَهُمْ كُفُّوٓا۟ أَيْدِيَكُمْ وَأَقِيمُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتُوا۟ ٱلزَّكَوٰةَ فَلَمَّا كُتِبَ عَلَيْهِمُ ٱلْقِتَالُ إِذَا فَرِيقٌ مِّنْهُمْ يَخْشَوْنَ ٱلنَّاسَ كَخَشْيَةِ ٱللَّهِ أَوْ أَشَدَّ خَشْيَةً ۚ وَقَالُوا۟ رَبَّنَا لِمَ كَتَبْتَ عَلَيْنَا ٱلْقِتَالَ لَوْلَآ أَخَّرْتَنَآ إِلَىٰٓ أَجَلٍ قَرِيبٍ ۗ قُلْ مَتَٰعُ ٱلدُّنْيَا قَلِيلٌ وَٱلْءَاخِرَةُ خَيْرٌ لِّمَنِ ٱتَّقَىٰ وَلَا تُظْلَمُونَ فَتِيلًا ﴿٧٧﴾ أَيْنَمَا تَكُونُوا۟ يُدْرِككُّمُ ٱلْمَوْتُ وَلَوْ كُنتُمْ فِي بُرُوجٍ مُّشَيَّدَةٍ ۗ وَإِن تُصِبْهُمْ حَسَنَةٌ يَقُولُوا۟ هَٰذِهِۦ مِنْ عِندِ ٱللَّهِ ۖ وَإِن تُصِبْهُمْ سَيِّئَةٌ يَقُولُوا۟ هَٰذِهِۦ مِنْ عِندِكَ ۚ قُلْ كُلٌّ مِّنْ عِندِ ٱللَّهِ ۖ فَمَالِ هَٰٓؤُلَآءِ ٱلْقَوْمِ لَا يَكَادُونَ يَفْقَهُونَ حَدِيثًا ﴿٧٨﴾ مَّآ أَصَابَكَ مِنْ حَسَنَةٍ فَمِنَ ٱللَّهِ ۖ وَمَآ أَصَابَكَ مِن سَيِّئَةٍ فَمِن نَّفْسِكَ ۚ وَأَرْسَلْنَٰكَ لِلنَّاسِ رَسُولًا ۚ وَكَفَىٰ بِٱللَّهِ شَهِيدًا ﴿٧٩﴾

(٧٥) (ئەی ئیمانداران) ئەوە چیتانەو بۆچی ناجەنگن لەپێناوی رەزامەندی خوادا و رزگار کردنی لاوازکراوو چەوساوەکان، لەو پیاوان و ئافرەتان و مندالانەی کە دەڵێن: پەروەردگارا تۆ رزگارمان بکە لەم شارەی کە خەڵکەکەی ستەمکارن و لەلایەن خۆتەوە پشتیوان و یارمەتیدەرێکمان بۆ ساز بکە.

(٧٦) ئەوانەی ئیماندارن (تەنها) لە پێناوی خوادا دەجەنگن (بەلام) ئەوانەی بێ باوەڕن لە پێناوی ستەمکارو زۆردار و(طاغوت) دا دەجەنگن، دە بجەنگن دژی یاوەرانی شەیتان (چونکە) بەڕاستی پیلان و تەڵەکەی شەیتان پووچ و لاوازە.

(٧٧) ئایا نەتڕوانیووەتە ئەوانەی کە پێیان وترا: دەست بپارێزن کاتی جەنگ نیە! بەڵکو هەر نوێژ بکەن و زەکات بدەن، کەچی کاتێک جەنگیان بۆ بڕیاردرا، دەستەیەکیان لە خەڵکی دەترسان بەقەدەر ئەوەی کە لە خوا دەترسن، یاخود زیاتریش و دەیانوت: خوایە تۆ بۆچی جەنگت لەسەر فەرزکردین، خۆزگە بۆ ماوەیەک دوات دەخستین، بەوانە بڵێ: رابواردنی ژیانی دنیا زۆر کەم و کورتە، ژیانی قیامەت چاکترو خۆشترو نەبڕاوەیە بۆ ئەو کەسەی لە خوا دەترسێت و پارێزکارە، لەوێ بەقەدەر تاڵی ناوکی خورمایەک ستەمتان لێناکرێت.

(٧٨) (دڵنیا بن) لە هەر کوێ بن مردن یەخەتان پێ دەگرێت، با لەناو چەندەها قەلاو شوێنی سەخت و قایمیشدا بن، (جا دووڕووەکان) ئەگەر خێریان بێتە رێ دەڵێن: ئەمە لە لایەن خواوەیە و ئەگەر توشی ناخۆشی و زیانێک بێن (بە پێغەمبەرﷺ) دەڵێن: ئەمەیان بەهۆی تۆوەیە، پێیان بڵێ: هەر هەمووی (هەرچی پێش دێت) لەلایەن خواوەیە و (بۆ تاقی کردنەوەیە) ئەوە بۆچی ئەو خەڵکە (باوەڕ لاوازە) هیچ شتێک تێناگەن و لە راستیەکان حاڵیی نابن.

(٧٩) (ڕاستە) کە هەرچی بۆ تۆ (بۆ هەرکەسێک) پێش دێت لە خێرو چاکە لە خواوەیە و هەرچی ناخۆشیەکیشت بۆ پێش دێت دەستی خۆتی تیایە (هەرچەندە بەبێ ویستی خوا روو نادات، بەلام پاداشتت هەیە ئەگەر خۆگر بێت) و ئێمە تۆمان ناردووە (ئەی محمدﷺ) بۆسەر خەڵکی بەپێغەمبەرایەتی (تا بیرو بۆچوونیان راست بکەیتەوە)، خوایش بەسە کە شایەتە بۆ ئەو مەبەستە.

مَّن يُطِعِ الرَّسُولَ فَقَدْ أَطَاعَ اللَّهَ وَمَن تَوَلَّىٰ فَمَا أَرْسَلْنَاكَ عَلَيْهِمْ حَفِيظًا ﴿٨٠﴾ وَيَقُولُونَ طَاعَةٌ فَإِذَا بَرَزُوا مِنْ عِندِكَ بَيَّتَ طَائِفَةٌ مِّنْهُمْ غَيْرَ الَّذِي تَقُولُ وَاللَّهُ يَكْتُبُ مَا يُبَيِّتُونَ فَأَعْرِضْ عَنْهُمْ وَتَوَكَّلْ عَلَى اللَّهِ وَكَفَىٰ بِاللَّهِ وَكِيلًا ﴿٨١﴾ أَفَلَا يَتَدَبَّرُونَ الْقُرْآنَ وَلَوْ كَانَ مِنْ عِندِ غَيْرِ اللَّهِ لَوَجَدُوا فِيهِ اخْتِلَافًا كَثِيرًا ﴿٨٢﴾ وَإِذَا جَاءَهُمْ أَمْرٌ مِّنَ الْأَمْنِ أَوِ الْخَوْفِ أَذَاعُوا بِهِ وَلَوْ رَدُّوهُ إِلَى الرَّسُولِ وَإِلَىٰ أُولِي الْأَمْرِ مِنْهُمْ لَعَلِمَهُ الَّذِينَ يَسْتَنبِطُونَهُ مِنْهُمْ وَلَوْلَا فَضْلُ اللَّهِ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَتُهُ لَاتَّبَعْتُمُ الشَّيْطَانَ إِلَّا قَلِيلًا ﴿٨٣﴾ فَقَاتِلْ فِي سَبِيلِ اللَّهِ لَا تُكَلَّفُ إِلَّا نَفْسَكَ وَحَرِّضِ الْمُؤْمِنِينَ عَسَى اللَّهُ أَن يَكُفَّ بَأْسَ الَّذِينَ كَفَرُوا وَاللَّهُ أَشَدُّ بَأْسًا وَأَشَدُّ تَنكِيلًا ﴿٨٤﴾ مَّن يَشْفَعْ شَفَاعَةً حَسَنَةً يَكُن لَّهُ نَصِيبٌ مِّنْهَا وَمَن يَشْفَعْ شَفَاعَةً سَيِّئَةً يَكُن لَّهُ كِفْلٌ مِّنْهَا وَكَانَ اللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ مُّقِيتًا ﴿٨٥﴾ وَإِذَا حُيِّيتُم بِتَحِيَّةٍ فَحَيُّوا بِأَحْسَنَ مِنْهَا أَوْ رُدُّوهَا إِنَّ اللَّهَ كَانَ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ حَسِيبًا ﴿٨٦﴾

(٨٠) ئەوەی فەرمانبەرداری پێغەمبەر ﷺ بکات، ئەوە بەڕاستی فەرمانبەرداری خوای کردووە، ئەوەش پشتی هەڵکردووە (ئەوە خۆی زەرەرمەند دەبێت) خۆ ئێمە تۆمان نەناردووە تا ببیتە چاودێر بەسەر ئەوانەوە.

(٨١) (دووڕووەکان کاتێک لای تۆن) دەڵێن: ملکەچ و فەرمانبەردارین، بەڵام کاتێک لای تۆ هەستان و دوورکەوتنەوە، دەستەیەکیان قسەکانی تۆ لە شەودا دەگۆڕن و ئەوە نالێن کە تۆ وتوتە، جا ئەوەی شەو هەڵی دەبەستن و (پیلانی بۆ دەکێشن) خوا تۆماری دەکات، کەواتە گوێ بەوانە مەدە و پشت بە خوا ببەستە تەنها خوات بەسە کە یارو یاوەرت بێت.

(٨٢) ئەوە بۆ ئەوانە سەرنجی قورئان نادەن و لێکی نادەنەوەو لێی وردنابنەوە؟ خۆ ئەگەر لە لایەن کەسێکی ترەوە بوایە جگەلە خوا بێگومان جیاوازی و دژایەتیەکی زۆریان تێدا دەدۆزیەوە.

(٨٣) (لێرەدا خوا ڕەخنە دەگرێت لە هەندێک ئیمانداران): هەرکاتێک هەواڵێکیان بۆ بێت دەربارەی ئاسایش و هێمنایەتی، یاخود ترس و بیم، بڵاوی دەکەنەوە (بیر لە سەرئەنجام ناکەنەوە)، خۆ ئەگەر ئەو هەواڵەیان بڵاو نەکردایەتەوە و بیانگێڕایەتەوە بۆلای پێغەمبەرو ﷺ، یان بۆ لای کاربەدەستانێک کە لە خۆیانن، ئەوە ئەوانەی کەلە نهێنی هەواڵەکان تێدەگەن و دەکۆڵنەوە، نهێنی و ڕازەکانیان لێ دەردەهێنا، جا ئەگەر فەزڵ و چاودێری خواو ڕەحمەت و میهرەبانیەکەی نەبوایە شوێنی شەیتان دەکەوتن، جگە لە کەمێکتان.

(٨٤) (ئەی پێغەمبەر ﷺ (بجەنگە لە پێناوی خوادا، چونکە ئەو ئەرکە هەر لەسەرشانی خۆتە، (واتە: هەتا ئەگەر تەنها خۆیشت بیت)، هەروەها هانی ئیماندارانیش بدە (بۆ بەشداری لە غەزاکاندا) ئومێدە خوای گەورە هێز لە بێ باوەڕان بسەنێتەوە و بەریان بگرێت و زاڵتان بکات بەسەریاندا، چونکە خوا هێزو دەسەڵاتی زۆرترە (بەڵکو بەراورد ناکرێت) و بەتوندی و سەختی تۆڵەیان لێدەسێنێت.

(٨٥) ئەوەی تکایەکی باش بکات، (لە نێوان خەڵکدا هەوڵی تەبایی بدات)، خەڵک هان بدات بۆ چاکەخوازی، ئەوە بەشێک لەو پاداشتی چاکەیەی بۆ هەیەو لەو خێرەدا بەشدارە (کە ڕۆڵی تیادا هەیە) هەروەها ئەوەش کە تکایەکی خراپ دەکات و ڕۆڵێکی خراپ دەبینێت و هەوڵی فیتنە بەرپا کردن دەدات و هاندەرێتی، ئەوە ئەویش بەشێکی مسۆگەری هەیە لە سزاو لێپرسینەوە، خوایش هەمیشەو بەردەوام ئاگاو چاودێرە بەسەر هەموو شتێکدا.

(٨٦) هەرکاتێک سڵاو و چاک و چۆنیەکتان لەگەڵدا کرا ئەوە بەجوانتر لە سڵاوەکەی ئەو یاخود (هیچ نەبێت) وەکو خۆی وەڵام بدەنەوە، بێگومان خوا لە هەموو شتێک دەپرسێتەوە.



ٱللَّهُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَۚ لَيَجۡمَعَنَّكُمۡ إِلَىٰ يَوۡمِ ٱلۡقِيَٰمَةِ لَا رَيۡبَ فِيهِۗ
وَمَنۡ أَصۡدَقُ مِنَ ٱللَّهِ حَدِيثٗا ﴿٨٧﴾ ۞ فَمَا لَكُمۡ فِي ٱلۡمُنَٰفِقِينَ
فِئَتَيۡنِ وَٱللَّهُ أَرۡكَسَهُم بِمَا كَسَبُوٓاْۚ أَتُرِيدُونَ أَن تَهۡدُواْ مَنۡ
أَضَلَّ ٱللَّهُۖ وَمَن يُضۡلِلِ ٱللَّهُ فَلَن تَجِدَ لَهُۥ سَبِيلٗا ﴿٨٨﴾ وَدُّواْ لَوۡ
تَكۡفُرُونَ كَمَا كَفَرُواْ فَتَكُونُونَ سَوَآءٗۖ فَلَا تَتَّخِذُواْ مِنۡهُمۡ أَوۡلِيَآءَ
حَتَّىٰ يُهَاجِرُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِۚ فَإِن تَوَلَّوۡاْ فَخُذُوهُمۡ وَٱقۡتُلُوهُمۡ
حَيۡثُ وَجَدتُّمُوهُمۡۖ وَلَا تَتَّخِذُواْ مِنۡهُمۡ وَلِيّٗا وَلَا نَصِيرًا ﴿٨٩﴾
إِلَّا ٱلَّذِينَ يَصِلُونَ إِلَىٰ قَوۡمِۭ بَيۡنَكُمۡ وَبَيۡنَهُم مِّيثَٰقٌ أَوۡ جَآءُوكُمۡ
حَصِرَتۡ صُدُورُهُمۡ أَن يُقَٰتِلُوكُمۡ أَوۡ يُقَٰتِلُواْ قَوۡمَهُمۡۚ وَلَوۡ شَآءَ
ٱللَّهُ لَسَلَّطَهُمۡ عَلَيۡكُمۡ فَلَقَٰتَلُوكُمۡۚ فَإِنِ ٱعۡتَزَلُوكُمۡ فَلَمۡ يُقَٰتِلُوكُمۡ
وَأَلۡقَوۡاْ إِلَيۡكُمُ ٱلسَّلَمَ فَمَا جَعَلَ ٱللَّهُ لَكُمۡ عَلَيۡهِمۡ سَبِيلٗا ﴿٩٠﴾
سَتَجِدُونَ ءَاخَرِينَ يُرِيدُونَ أَن يَأۡمَنُوكُمۡ وَيَأۡمَنُواْ قَوۡمَهُمۡ كُلَّ
مَا رُدُّوٓاْ إِلَى ٱلۡفِتۡنَةِ أُرۡكِسُواْ فِيهَاۚ فَإِن لَّمۡ يَعۡتَزِلُوكُمۡ وَيُلۡقُوٓاْ إِلَيۡكُمُ
ٱلسَّلَمَ وَيَكُفُّوٓاْ أَيۡدِيَهُمۡ فَخُذُوهُمۡ وَٱقۡتُلُوهُمۡ حَيۡثُ
ثَقِفۡتُمُوهُمۡۚ وَأُوْلَٰٓئِكُمۡ جَعَلۡنَا لَكُمۡ عَلَيۡهِمۡ سُلۡطَٰنٗا مُّبِينٗا ﴿٩١﴾

(٨٧) (الله) خوایەکە بێجگە لەو هیچ خوایەکی تر نیە (شایستەی پەرستن بێت) سوێند بە خوا لە رۆژی قیامەتدا کۆتاندەکاتەوە و هیچ شک و گومانێکی تێدا نییە، جا کێ هەیە قسە و گوفتاری لە فەرمایش و فەرموودەی خوا راستترو دروستتر بێت ؟

(٨٨) جا ئەوە چیتانە (ئەی ئیمانداران) دەربارەی دووڕووەکان بوون بە دوو دەستەوە؟! لە کاتێکدا خوا (سەر شۆری کردوون) و وەری گێڕاونەتەوە بۆ بێ باوەڕی بەهۆی ئەو کردەوانەی کە کردوویانە، ئایا دەتانەوێت (دڵی) کەسێک هیدایەت و رێنموویی بکەن کە خوا گومڕای کردووە؟! (بەهۆی باوەڕی دانەمەزراو و دڵ و دەروونی نەخۆشیەوە)، بێگومان ئەوەی خوا گومڕای بکات (بەهۆی کارو کردەوەی ناپەسەندیەوە) ئەوە هەرگیز رێگەیەکت دەست ناکەوێت بۆ رێنموویی کردنی.

(٨٩) (ئەو دووڕووانە) ئاواتەخوازن کە ئێوەش بێ باوەڕ بن وەک خۆیان بێ باوەڕ بوون، ئەو کاتە (هەردوولاتان) یەکسان دەبن لە بێ باوەڕیدا، کەواتە لەوانە پشتیوان و یاوەر مەگرن هەتا کۆچ دەکەن لەپێناوی خوادا، خۆ ئەگەر یاخی بوون و پشتیان تێکردن، ئێوە بیانگرن و بیانکوژن لە هەر کوێدا ئەوانەتان دەستکەوت، هەرگیز نەکەن ئەوانە بکەنە یاوەرو هاوکار...

(٩٠) جگە لەوانەی کە پەنا دەبەنە بەر تیرە و هۆزێک پەیمان لەنێوان ئێوە و ئەواندا بەستراوە، یاخود هاتبن بۆ لای ئێوە لەکاتێکدا دڵیان تەنگ و بێزار بێت لەوەی جەنگتان لەگەڵ بکەن یان دژی تیرە و هۆزەکەی خۆیان بجەنگن، خۆ ئەگەر خوا بیویستایە ئەوانی زاڵ دەکرد بەسەرتانداو دژتان دەجەنگان، جا ئەگەر ئەوانە دوورە پەرێزو کەنارگیر بوون لە ئێوە و جەنگیان لەگەڵ نەکردن و رێبازی ئاشتیان گرتەبەرو ملکەچ بوون، ئەوە خوا هیچ رێگەیەکی دانەناوە بۆ ئێوە بەسەر ئەوانەوە (کە شەڕیان پێ بفرۆشن بیانکوژن یان بەدیل بیانگرن).

(٩١) (هەروەها) چەند کەسانێکی ترتان دەستدەکەوێت کە دەیانەوێت لە ئێوەش و لە هۆز و قەومی خۆشیان ئەمین بن، هەر کاتێک بانگ کرابنەوە بۆ ئاشووبنانەوە درێغیان نەکردووە و رۆچوون تیایدا و چاکتر تێهەڵچوونەتەوە، جا ئەگەر ئەوانە دوورە پەرێزیان نەگرت لێتان و کەنارگیر نەبوون و رێبازی ئاشتیان نەگرتەبەرو دەستیان نەکێشایەوە لە جەنگ کردن لەگەڵتان، ئەو کاتە بیانگرن و بیانکوژن لە هەر کوێ دەستان رۆیی بەسەریاندا، ئا ئەوانە گێڕاومانە بۆتان بەسەریانەوە بەڵگەیەکی روون و ئاشکرا لەسەر (راست و رەوایی کوشتن و بەدیل کردنیان).

وَمَا كَانَ لِمُؤْمِنٍ أَن يَقْتُلَ مُؤْمِنًا إِلَّا خَطَـًٔا ۚ وَمَن قَتَلَ مُؤْمِنًا خَطَـًٔا فَتَحْرِيرُ رَقَبَةٍ مُّؤْمِنَةٍ وَدِيَةٌ مُّسَلَّمَةٌ إِلَىٰٓ أَهْلِهِۦٓ إِلَّآ أَن يَصَّدَّقُوا۟ ۚ فَإِن كَانَ مِن قَوْمٍ عَدُوٍّ لَّكُمْ وَهُوَ مُؤْمِنٌ فَتَحْرِيرُ رَقَبَةٍ مُّؤْمِنَةٍ ۖ وَإِن كَانَ مِن قَوْمٍۭ بَيْنَكُمْ وَبَيْنَهُم مِّيثَـٰقٌ فَدِيَةٌ مُّسَلَّمَةٌ إِلَىٰٓ أَهْلِهِۦ وَتَحْرِيرُ رَقَبَةٍ مُّؤْمِنَةٍ ۖ فَمَن لَّمْ يَجِدْ فَصِيَامُ شَهْرَيْنِ مُتَتَابِعَيْنِ تَوْبَةً مِّنَ ٱللَّهِ ۗ وَكَانَ ٱللَّهُ عَلِيمًا حَكِيمًا ﴿٩٢﴾ وَمَن يَقْتُلْ مُؤْمِنًا مُّتَعَمِّدًا فَجَزَآؤُهُۥ جَهَنَّمُ خَـٰلِدًا فِيهَا وَغَضِبَ ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَلَعَنَهُۥ وَأَعَدَّ لَهُۥ عَذَابًا عَظِيمًا ﴿٩٣﴾ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ إِذَا ضَرَبْتُمْ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ فَتَبَيَّنُوا۟ وَلَا تَقُولُوا۟ لِمَنْ أَلْقَىٰٓ إِلَيْكُمُ ٱلسَّلَـٰمَ لَسْتَ مُؤْمِنًا تَبْتَغُونَ عَرَضَ ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا فَعِندَ ٱللَّهِ مَغَانِمُ كَثِيرَةٌ ۚ كَذَٰلِكَ كُنتُم مِّن قَبْلُ فَمَنَّ ٱللَّهُ عَلَيْكُمْ فَتَبَيَّنُوٓا۟ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرًا ﴿٩٤﴾

(٩٢) بۆ هیچ ئیماندارێک نیە ئیماندارێکی تر بکوژێت مەگەر بە هەڵە، خۆ ئەگەر کەسێکی ئیماندار بە هەڵە ئیماندارێک بکوژێت، ئەوە دەبێت بەندەیەکی ئیماندار ئازاد بکات و خوێن باییەکەی بدات بە کەسوکاری کوژراوەکە (وەک میراتی دابەشی بکەن) مەگەر لێی ببوورن و لە خوێنەکەی خۆش ببن، خۆ ئەگەر کوژراوەکە لە ناو قەوم و دەستەیەکدا بوو دوژمنی ئێوە بوون، بەڵام ئەو(کوژراوە) ئیماندار بوو، با (بکوژەکە) بەندەیەکی ئیماندار ئازادبکات و ئەگەر ئیماندارە کوژراوەکە لەناو قەوم و دەستەیەک بوو کە پەیمان لەنێوانتاندا هەبوو، دەبێت خوێنبایی بدرێت بەکەسوکاری و بەندەیەکی ئیمانداریش ئازاد بکرێت، (خۆ ئەگەر بکوژەکە ئەوەی بۆ نەلواو دەستی نەکەوت (بەندە ئازاد بکات و بەندایەتی باوی نەمابوو ماڵ وسامانیشی نەبوو) ئەوە دەبێت دوومانگ لەسەریەک بەرۆژوو بێت، ئەمە بڕیارێکە بۆ راستی و دروستی تەوبە و گەڕانەوەکەی، ئەمەش لەلایەن خواوەیە، بێگومان خوای گەورە هەمیشە و بەردەوام زاناو دانایە.

(٩٣) هەر کەسێک بەدەستی ئەنقەست ئیماندارێک بکوژێت (بەحەلالی بزانێت)، ئەوە تۆڵەی ئەو کەسە دۆزەخە، ئەمرە تیایدا، هەروەها خوا لێی تورە بووە و نەفرینی لێکردووە و سزایەکی گەورە و بێ‌سنووری بۆ ئامادە کردووە.

(٩٤) ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە، کاتێک دەرئەچن بۆ گەیاندنی ئیسلام و جیهاد لەپێناوی خوادا، ووردبین بن و هەموو شتێک روون بکەنەوە (دوورە پەرێزبن لە پەلەو هەڵەشەیی) و بەوکەسانە مەڵێن کە سەلامتان لێدەکەن: (راست ناکەیت) تۆ ئیماندارنیت!! (بەو هەڵوێستە) مەبەستتان دەسکەوتی ژیانی دنیابێت، لای خوا دەستکەوتی زۆر هەیە، خۆ کاتی خۆی ئێوەش وابوون (باوەڕتان شاراوە بوو) تا خوا منەتی نایە سەرتان (سەرکەوتنی پێبەخشین و دەرووی لێکردنەوە)کەواتە، وردو دووربین بن، چونکە بەراستی خوا ئاگادارە بەهەموو ئەوکاروکردەوانەی کە دەیکەن.
(پێغەمبەر ﷺ دەستەیەک لە هاوەڵانی نارد بۆ گەیاندنی ئیسلام، ئوسامەی کوڕی زەیدی کردە لێپرسراویان، کابرایەک کە ناوی (مەرداس) بوو مەڕو وشتری دەلەوەڕان، ئوسامەو هاوەڵانی بینی، ترساو بەپەلە دوور کەوتەوەو خۆی کرد بە ئەشکەوتێکدا، ئەمانیش شوێنی کەوتن، کاتێک چوونە بەردەم ئەشکەوتەکە کابرا هات بەپیریانەوەو سەلامی لێکردن و شایەتمانی هێنا، بەڵام ئوسامە هێرشی کردە سەری و کوشتی.. دوایی کە پێغەمبەر ﷺ بیستی تووڕە بوو لە ئوسامە و فەرمووی: بۆچی کوشتت؟ ئایا دڵ و سینەتان هەڵدڕی بوو بزانن بەڕاستێتی یان نا!!)...

لَّا يَسْتَوِي الْقَاعِدُونَ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ غَيْرُ أُولِي الضَّرَرِ وَالْمُجَاهِدُونَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ بِأَمْوَالِهِمْ وَأَنفُسِهِمْ ۚ فَضَّلَ اللَّهُ الْمُجَاهِدِينَ بِأَمْوَالِهِمْ وَأَنفُسِهِمْ عَلَى الْقَاعِدِينَ دَرَجَةً ۚ وَكُلًّا وَعَدَ اللَّهُ الْحُسْنَىٰ ۚ وَفَضَّلَ اللَّهُ الْمُجَاهِدِينَ عَلَى الْقَاعِدِينَ أَجْرًا عَظِيمًا ﴿٩٥﴾ دَرَجَاتٍ مِّنْهُ وَمَغْفِرَةً وَرَحْمَةً ۚ وَكَانَ اللَّهُ غَفُورًا رَّحِيمًا ﴿٩٦﴾ إِنَّ الَّذِينَ تَوَفَّاهُمُ الْمَلَائِكَةُ ظَالِمِي أَنفُسِهِمْ قَالُوا فِيمَ كُنتُمْ ۖ قَالُوا كُنَّا مُسْتَضْعَفِينَ فِي الْأَرْضِ ۚ قَالُوا أَلَمْ تَكُنْ أَرْضُ اللَّهِ وَاسِعَةً فَتُهَاجِرُوا فِيهَا ۚ فَأُولَٰئِكَ مَأْوَاهُمْ جَهَنَّمُ ۖ وَسَاءَتْ مَصِيرًا ﴿٩٧﴾ إِلَّا الْمُسْتَضْعَفِينَ مِنَ الرِّجَالِ وَالنِّسَاءِ وَالْوِلْدَانِ لَا يَسْتَطِيعُونَ حِيلَةً وَلَا يَهْتَدُونَ سَبِيلًا ﴿٩٨﴾ فَأُولَٰئِكَ عَسَى اللَّهُ أَن يَعْفُوَ عَنْهُمْ ۚ وَكَانَ اللَّهُ عَفُوًّا غَفُورًا ﴿٩٩﴾ ۞ وَمَن يُهَاجِرْ فِي سَبِيلِ اللَّهِ يَجِدْ فِي الْأَرْضِ مُرَاغَمًا كَثِيرًا وَسَعَةً ۚ وَمَن يَخْرُجْ مِن بَيْتِهِ مُهَاجِرًا إِلَى اللَّهِ وَرَسُولِهِ ثُمَّ يُدْرِكْهُ الْمَوْتُ فَقَدْ وَقَعَ أَجْرُهُ عَلَى اللَّهِ ۗ وَكَانَ اللَّهُ غَفُورًا رَّحِيمًا ﴿١٠٠﴾ وَإِذَا ضَرَبْتُمْ فِي الْأَرْضِ فَلَيْسَ عَلَيْكُمْ جُنَاحٌ أَن تَقْصُرُوا مِنَ الصَّلَاةِ إِنْ خِفْتُمْ أَن يَفْتِنَكُمُ الَّذِينَ كَفَرُوا ۚ إِنَّ الْكَافِرِينَ كَانُوا لَكُمْ عَدُوًّا مُّبِينًا ﴿١٠١﴾



(٩٥) ئەوانەی دانیشتوون لە ئیمانداران و (جەنگ ناکەن) ـ مەگەر ئەوانەیان کە ناتەواون ـ (کوێر، شەل، نەخۆش،...هتد) لەگەڵ ئەوانەدا کە جیهادو کۆشش دەکەن لە پێناوی خوادا بە ماڵ و سامان و خۆیان چوونیەک نین، بێگومان خوا فەزڵ و ڕێزو پلەیەکی تایبەتی بڕیارداوە بۆ تێکۆشەران بە ماڵیان و خۆیان، بەسەر ئەوانەدا کە دانیشتوون و (فیداکاری ناکەن و گیان بەخت ناکەن)، خوای گەورە بەهەر دەستەیەکیان بەڵێنی چاک و بەنرخی داوە، (بێگومان) خوا فەزڵ و ڕێزو پاداشتی گەورە و بێسنووری ئەو تێکۆشەر و موجاهیدانەی داوە بەسەر ئەو دانیشتوانەدا...

(٩٦) ئەویش چەندەها پلەو پایەن (بەگوێرەی هەوڵ و کۆشش) لەلایەن خواوە پێشکەش دەکرێن (بەگوێرەی ڕادەی نیەت پاکیی وتێکۆشان)، هاوڕێ لەگەڵ لێخۆشبوون و ڕەحمەتدا، چونکە خوا هەمیشەو بەردەوام لێخۆشبووەو بە ڕەحم و دلۆڤانە.

(٩٧) بەڕاستی ئەوانەی لە سەرە مەرگدا فریشتە گیانیان دەکێشن لەکاتێکدا ئەوان هەمیشە ستەمیان لە خۆیان دەکرد (ئیمان و باوەڕیان لە مەترسیدا بوو کەچی کۆچیان نەدەکرد بۆ نیشتمانی ئیمان، بەتوندیی پیایاندا هەڵدەشاخێن)و دەڵێن: باشە ئێوە لە چیدا بوون و لەکوێ ژیانتان دەبردە سەر؟! لە وەڵامدا دەڵێن: ئێمە بێدەسەڵات و لاواز کراو بووین لە زەویدا، فریشتەکان دەڵێن: باشە ئایا زەوی خوا فراوان و پان و پۆڕ نەبوو تا کۆچی تێدا بکەن و (کۆچ بکەن بۆ نیشتمانێک کە ئیمانداران تیایدا فەرمانڕەوان یاخود سەربەستن)؟ ئا ئەوانە شوێنەواریان دۆزەخە، کە جێگە و ڕێگە و سەرەنجامێکی ناخۆش و ناسازو خراپە.

(٩٨) مەگەر ئەوانەیان کە بەڕاستی بێدەسەڵات و ناتەوان و لاوازکراون لەو پیاوانەی ژن و منداڵیان لەگەڵدایەو ناتوانن تەگبیرو گۆڕانکاریەک بۆ خۆیان بکەن و هیچ ڕێگەیەکیش شارەزانین بۆ چارەسەرو دەربازکردنی خۆیان.

(٩٩) ئا ئەوانە خوا لێبووردن و چاوپۆشی بۆ ئامادە کردوون و خوا هەمیشەو بەردەوام زۆر لێخۆشبووەو زۆریش چاوپۆشی دەکات (مەبەست لە وشەی ـ عسى ـ بۆ هاتنە دی بەڵێنە خواییەکەیە).

(١٠٠) جا ئەوەی کۆچ بکات لە پێناوی خوادا لەو زەوییەی کە کۆچی بۆ دەکات، سەربەرزییەک بۆ خۆی و ڕیسواییەکی زۆریش بۆ دوژمنانی دروست دەکات، بەرەکەت و فراوانی ڕزق و ڕۆزی ڕووی تێدەکات، هەر کەسێکیش ماڵ وحاڵی خۆی بەجێ بهێڵێت ولە پێناو خواو پێغەمبەرەکەیدا دەرچێت (واتە بەرەو وڵاتی ئیسلام، یاخود شوێنێکی ئازاد) کۆچ بکات، پاشان مردن یەخەی پێبگرێت، ئەوە ئیتر ئەو کەسە پاداشتەکەی کەوتۆتە سەر خوا (هەر خۆی دەزانێت چۆن پاداشتی دەداتەوە)، خوا هەمیشەو بەردەوام لێخۆشبوو میهرەبانە (بەتایبەت بۆ ئەو جۆرە کەسانە).

(١٠١) هەر کاتێک بەسەفەر بەلایەکی زەویدا ڕۆیشتن، ئەوە گوناهبار نابن بەکورت کردنەوەی نوێژ، (بەتایبەت) ئەگەر ترسان ئەوانەی خوانەناسن پیلان و بەڵایەکتان بەسەربهێنن وئازارتان بدەن، چونکە بەڕاستی کافران دوژمنانی ئاشکرای ئێوەن.

وَإِذَا كُنتَ فِيهِمْ فَأَقَمْتَ لَهُمُ ٱلصَّلَوٰةَ فَلْتَقُمْ طَآئِفَةٌ
مِّنْهُم مَّعَكَ وَلْيَأْخُذُوٓاْ أَسْلِحَتَهُمْ فَإِذَا سَجَدُواْ فَلْيَكُونُواْ
مِن وَرَآئِكُمْ وَلْتَأْتِ طَآئِفَةٌ أُخْرَىٰ لَمْ يُصَلُّواْ
فَلْيُصَلُّواْ مَعَكَ وَلْيَأْخُذُواْ حِذْرَهُمْ وَأَسْلِحَتَهُمْ وَدَّ ٱلَّذِينَ
كَفَرُواْ لَوْ تَغْفُلُونَ عَنْ أَسْلِحَتِكُمْ وَأَمْتِعَتِكُمْ فَيَمِيلُونَ
عَلَيْكُم مَّيْلَةً وَٰحِدَةً وَلَا جُنَاحَ عَلَيْكُمْ إِن كَانَ بِكُمْ
أَذًى مِّن مَّطَرٍ أَوْ كُنتُم مَّرْضَىٰٓ أَن تَضَعُوٓاْ أَسْلِحَتَكُمْ
وَخُذُواْ حِذْرَكُمْ إِنَّ ٱللَّهَ أَعَدَّ لِلْكَٰفِرِينَ عَذَابًا مُّهِينًا ﴿١٠٢﴾
فَإِذَا قَضَيْتُمُ ٱلصَّلَوٰةَ فَٱذْكُرُواْ ٱللَّهَ قِيَٰمًا وَقُعُودًا وَعَلَىٰ
جُنُوبِكُمْ فَإِذَا ٱطْمَأْنَنتُمْ فَأَقِيمُواْ ٱلصَّلَوٰةَ إِنَّ ٱلصَّلَوٰةَ
كَانَتْ عَلَى ٱلْمُؤْمِنِينَ كِتَٰبًا مَّوْقُوتًا ﴿١٠٣﴾ وَلَا تَهِنُواْ
فِي ٱبْتِغَآءِ ٱلْقَوْمِ إِن تَكُونُواْ تَأْلَمُونَ فَإِنَّهُمْ يَأْلَمُونَ كَمَا
تَأْلَمُونَ وَتَرْجُونَ مِنَ ٱللَّهِ مَا لَا يَرْجُونَ وَكَانَ ٱللَّهُ عَلِيمًا
حَكِيمًا ﴿١٠٤﴾ إِنَّآ أَنزَلْنَآ إِلَيْكَ ٱلْكِتَٰبَ بِٱلْحَقِّ لِتَحْكُمَ بَيْنَ
ٱلنَّاسِ بِمَآ أَرَىٰكَ ٱللَّهُ وَلَا تَكُن لِّلْخَآئِنِينَ خَصِيمًا ﴿١٠٥﴾

(١٠٢) کاتێکیش تۆ (ئەی پێغەمبەر ﷺ لەناو هاوەڵاندا بویت و پێش نوێژیت بـۆ دەکـردن (لـە کاتی جـەنگدا)، ئـەوە بـا دەسـتـەیەکیان لەگـەڵ تۆدا بوەستن بۆ نوێژ و چەکەکانیان پێ بێت، جا کاتێک ئەم دەستەیەی کـە نوێـژ دەکـات چوونـە سووژدە بائەوانی تر لە پشتانەوە بن (ئینجا کـە لێبوونـەوە لـەو رکاتـە) ئـەو دەسـتـەیەی تـر کـە پاسـەوانییان دەکـردو نوێژیـان نـەکردووە بـابێن لەگـەڵ تـۆدا نوێژەکـەیان بکـەن، بـا هوشـیارو چەکداریش بن، چونکە بـێ بـاوەڕان ئاواتـەخوازن کە ئێوە غافڵ بـن لـە چەکـەکانتان و لـە کـەل و پـەلتان، تایـەک هـێرش بکەنـە سـەرتان وتـەفرو توناتـان بکـەن، بـەڵام بۆتـان هەیـە و قـەیناکات چەکەکانتان دانێن ئەگەر نارەحەت بـوون بـەهۆی بارانـــەوە، یـــان هــەندێکتان نەخۆشــکەوتن، هەمیشە وریابن، بەڕاستی خوا سزای ریسواکەرو شەرمەزاری بۆ خوانەناسان ئامادە کردووە.

(١٠٣) جا کاتێک لە نوێژ بوونەوە ئـەوە یـادی خوا بکەن بـەپێوەبن یـان بەدانیشـتنەوە یـان بـە راکشـانەوە (بەهــەرجۆرێک بۆتــان گونجــا) کـاتێکیش ئـارامی بـاڵی کێشـا بەسـەرتانداو نیشتەجێ بوون، ئەوە نوێژ بەچاکی و تەواوی ئەنجام بدەن، چونکـە بەڕاسـتی نوێـژ لەسـەر ئیمـانداران فـەرزە لـەکاتی دیاریکراودا دەبێ ئەنجام بدرێت.

(١٠٤) لە بەرامبـەر (لەشکری بـێ باوەڕانـەوە کـە شـەڕتان پـێ دەفرۆشـن یـان بەربەسـتن لـە رێگـەی پێگـەیاندنی بانگەوازی خوادا) سستی و کەمتەرخەمی مەکەن و بکەونە دوایان، چونکە ئەگـەر ئێـوە ئێش و ئـازارو مـاندوێتی و برینداریتان بۆ پێش بێت، بۆ ئەوانیش هەرپێش دێت، بەڵام ئەوەی ئێـوە بـەئومێدو بەتـەمان لەلایـەن خـواوە دەسـتان بکەوێت (لە بەهەشتدا) ئەوان بە تەمای نین، خوا هەمیشە و بەردەوام زاناو دانایە.

(١٠٥) ئێمە بەڕاستی قورئانمان بۆ لای تۆ دابەزاندوەتە خوارەوە، سەرتاپای حـەق و راستی بەردەوامـە، بـۆ ئـەوەی دادوەری بکەیت لە نێوان خەڵکیدا بەو شێوەیەی کە خوا نیشانی داویت و رێنموویی کردویـت و بـەگونجاوی دەزانیـت (بۆ چارەسەری کێشەکان و بەڕێوەبردنی کۆمەڵگا و قازانجی خەڵکی)، نەکەیت بەرگری لە ناپاکان بکەیت...

(دەگێڕنەوە جولەکەیەک لای (طعمة) ناوێک قەڵغانێک بەئەمانەت دادەنێت، بەڵام (طعمة) حاشـای لێدەکـات، کـە دێنماڵەکەی بگەڕێن فرێی دەداتە ماڵە دراوسێکەیەوە، جاکە کێشـەکە دەگاتـە لای پێغەمبـەر ﷺ خەریکـە لایـەنی (طعمة) بگرێت، چونکە زۆر بەدەم و پل بووە، بەڵام خوای گەورە ئەم چەند ئایەتە دادەبەزێنێت لە (١٠٥ تا ١١٣).

وَٱسْتَغْفِرِ ٱللَّهَ ۖ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ غَفُورًا رَّحِيمًا ﴿١٠٦﴾ وَلَا تُجَٰدِلْ عَنِ ٱلَّذِينَ يَخْتَانُونَ أَنفُسَهُمْ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ مَن كَانَ خَوَّانًا أَثِيمًا ﴿١٠٧﴾ يَسْتَخْفُونَ مِنَ ٱلنَّاسِ وَلَا يَسْتَخْفُونَ مِنَ ٱللَّهِ وَهُوَ مَعَهُمْ إِذْ يُبَيِّتُونَ مَا لَا يَرْضَىٰ مِنَ ٱلْقَوْلِ ۚ وَكَانَ ٱللَّهُ بِمَا يَعْمَلُونَ مُحِيطًا ﴿١٠٨﴾ هَٰٓأَنتُمْ هَٰٓؤُلَآءِ جَٰدَلْتُمْ عَنْهُمْ فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا فَمَن يُجَٰدِلُ ٱللَّهَ عَنْهُمْ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ أَم مَّن يَكُونُ عَلَيْهِمْ وَكِيلًا ﴿١٠٩﴾ وَمَن يَعْمَلْ سُوٓءًا أَوْ يَظْلِمْ نَفْسَهُۥ ثُمَّ يَسْتَغْفِرِ ٱللَّهَ يَجِدِ ٱللَّهَ غَفُورًا رَّحِيمًا ﴿١١٠﴾ وَمَن يَكْسِبْ إِثْمًا فَإِنَّمَا يَكْسِبُهُۥ عَلَىٰ نَفْسِهِۦ ۚ وَكَانَ ٱللَّهُ عَلِيمًا حَكِيمًا ﴿١١١﴾ وَمَن يَكْسِبْ خَطِيٓـَٔةً أَوْ إِثْمًا ثُمَّ يَرْمِ بِهِۦ بَرِيٓـًٔا فَقَدِ ٱحْتَمَلَ بُهْتَٰنًا وَإِثْمًا مُّبِينًا ﴿١١٢﴾ وَلَوْلَا فَضْلُ ٱللَّهِ عَلَيْكَ وَرَحْمَتُهُۥ لَهَمَّت طَّآئِفَةٌ مِّنْهُمْ أَن يُضِلُّوكَ وَمَا يُضِلُّونَ إِلَّآ أَنفُسَهُمْ ۖ وَمَا يَضُرُّونَكَ مِن شَىْءٍ ۚ وَأَنزَلَ ٱللَّهُ عَلَيْكَ ٱلْكِتَٰبَ وَٱلْحِكْمَةَ وَعَلَّمَكَ مَا لَمْ تَكُن تَعْلَمُ ۚ وَكَانَ فَضْلُ ٱللَّهِ عَلَيْكَ عَظِيمًا ﴿١١٣﴾

(١٠٦) **(ئەی محمد ﷺ بەردەوام) داوای لێخۆش بوون لە خوا بکە، چونکە بەڕاستی ئەو خوایە هەمیشەو بەردەوام لێخۆشبوو میهرەبانە.**

(١٠٧) **بەرگری لەو کەسانەش مەکە کە ناپاکن و خیانەت لە خۆیان دەکەن، چونکە بەڕاستی خوا ئەو کەسانەی خۆش ناوێت هەمیشە خیانەتکارو تاوانبارن.**

(١٠٨) **ئەوانە دەیانەوێت خیانەت و تاوانەکانیان لەخەڵکی بشارنەوە، لەکاتێکدا ناتوانن لە خوای بشارنەوە کە لەگەڵیاندایەو چاودێریانە، بەشەودا قسەی واهەڵدەبەستن خوا پێی رازی نیە و خوا بەردەوام گەمارۆدەری ئەو کارو کردەوانەیە کە ئەنجامی دەدەن.**

(١٠٩) **باشە ئەوەتە ئێوە بەرگریان لێدەکەن لە ژیانی ئەم دنیایەدا، ئەی رۆژی قیامەت، لای خوا کێ بەرگریان لێدەکات؟ یاخود کێ پشتیوان و یاریدەدەریان دەبێت (تا لە سزای دۆزەخ رزگاریان بکات)؟**

(١١٠) **ئەوەی خراپەیەک بکات (دژ بەخەڵکی) یان ستەم لە خۆی بکات لەوەودوا (بەخۆیدا بچێتەوە) و داوای لێخۆشبوون لە خوا بکات، ئەوە خوایەکی لێخۆشبوو و میهرەبانی دەستدەکەوێت.**

(١١١) **ئەوەش کە گوناهو تاوانێک ئەنجام دەدات، ئەوە بەزیانی خۆی تەواو دەبێت، زیان بەخۆی دەگات (لە قیامەتدا)، بێگومان خوا هەمیشەو بەردەوام زاناو دانایە.**

(١١٢) **جا ئەوەی هەڵەیەک یان تاوانێک ئەنجام بدات و لەوەودوا بیسەپێنێت بەسەر بێ تاوانێکداو بێ تاوانێکی پێ لەکەدار بکات، بێگومان ئەو کەسە بوختان و تاوانێکی ئاشکرای ئەنجامداوە و تاوانێکی گەورەی کردووە (زیاد لە گوناهەکەی خۆی).**

(١١٣) **خۆ ئەگەر فەزڵ و رەحمەتی خوا نەبوایە بەسەرتەوە خەریک بوو هەندێکیان سەرت لێ بشێوێنن، بێگومان ئەوان بەو کارەیان هەر سەر لە خۆیان دەشێوێنن، دڵنیابە کە ناتوانن لە هیچ شتێکدا زیانت پێبگەیەنن، خوای گەورەش قورئان و دانایی بۆ دابەزاندوویت و فێری ئەو شتانەی کردوویت کە جاران نەتدەزانی، بەردەوامیش فەزڵ و رێزی خوا لەسەر تۆ (ئەی محمدﷺ) زۆرو فراوان و ئاشکراو دیارە و (نایەڵێت تووشی هەڵە ببیت).**

۞ لَّا خَيْرَ فِي كَثِيرٍ مِّن نَّجْوَاهُمْ إِلَّا مَنْ أَمَرَ بِصَدَقَةٍ أَوْ مَعْرُوفٍ أَوْ إِصْلَاحٍ بَيْنَ النَّاسِ ۚ وَمَن يَفْعَلْ ذَٰلِكَ ابْتِغَاءَ مَرْضَاتِ اللَّهِ فَسَوْفَ نُؤْتِيهِ أَجْرًا عَظِيمًا ﴿١١٤﴾ وَمَن يُشَاقِقِ الرَّسُولَ مِن بَعْدِ مَا تَبَيَّنَ لَهُ الْهُدَىٰ وَيَتَّبِعْ غَيْرَ سَبِيلِ الْمُؤْمِنِينَ نُوَلِّهِ مَا تَوَلَّىٰ وَنُصْلِهِ جَهَنَّمَ ۖ وَسَاءَتْ مَصِيرًا ﴿١١٥﴾ إِنَّ اللَّهَ لَا يَغْفِرُ أَن يُشْرَكَ بِهِ وَيَغْفِرُ مَا دُونَ ذَٰلِكَ لِمَن يَشَاءُ ۚ وَمَن يُشْرِكْ بِاللَّهِ فَقَدْ ضَلَّ ضَلَالًا بَعِيدًا ﴿١١٦﴾ إِن يَدْعُونَ مِن دُونِهِ إِلَّا إِنَاثًا وَإِن يَدْعُونَ إِلَّا شَيْطَانًا مَّرِيدًا ﴿١١٧﴾ لَّعَنَهُ اللَّهُ ۘ وَقَالَ لَأَتَّخِذَنَّ مِنْ عِبَادِكَ نَصِيبًا مَّفْرُوضًا ﴿١١٨﴾ وَلَأُضِلَّنَّهُمْ وَلَأُمَنِّيَنَّهُمْ وَلَآمُرَنَّهُمْ فَلَيُبَتِّكُنَّ آذَانَ الْأَنْعَامِ وَلَآمُرَنَّهُمْ فَلَيُغَيِّرُنَّ خَلْقَ اللَّهِ ۚ وَمَن يَتَّخِذِ الشَّيْطَانَ وَلِيًّا مِّن دُونِ اللَّهِ فَقَدْ خَسِرَ خُسْرَانًا مُّبِينًا ﴿١١٩﴾ يَعِدُهُمْ وَيُمَنِّيهِمْ ۖ وَمَا يَعِدُهُمُ الشَّيْطَانُ إِلَّا غُرُورًا ﴿١٢٠﴾ أُولَٰئِكَ مَأْوَاهُمْ جَهَنَّمُ وَلَا يَجِدُونَ عَنْهَا مَحِيصًا ﴿١٢١﴾

(١١٤) لە زۆربەی چپەو سرتەوقسە نهێنیەکانیاندا هیچ خێرێک بەدی ناکرێت و تیایدا نیە، مەگەر چپەی ئەو کەسەی کە فەرمان بدات بەبەخشینێک، یان چاکەیەک، یان ڕێکخستن و چاکسازی و ناشتبونەوەیەکی نێوان خەڵکی، جا ئەوەی (ئەو شێوازە چاکەیە) ئەنجام بدات و مەبەستی تەنها دەستکەوتنی ڕەزامەندی خوا بێت، ئەوە لە ئاییندەدا پاداشتی زۆرو بێ سنوور و گەورەی پێدەبەخشین.

(١١٥) ئەوەش دوژمنایەتی پێغەمبەرﷺ بکات و لێی جیابێتەوە لە دوای ئەوەی ڕێگەی ڕاست و دروستی بۆ روون بۆتەوە و ڕێبازێک بگرێتەبەر کە جیابێت لە ڕێگە و ڕێبازی ئیمانداران، ئەوە ڕووی وەردەچەرخێنین بۆ ئەو ڕووگەو بەرنامەیەی هەڵی بژاردووەو ڕووی تێکردووە، (لە قیامەتیشدا) دەیخەینە ناو دۆزەخەوە و دەیسوتێنین کە ئەویش سەرئەنجامێکی زۆر ناخۆش و سامناکە.

(١١٦) بەڕاستی خوا خۆش نابێت لەوە هاوەڵ و شەریکی بۆ بڕیار بدرێت و جگە لەو (هاوبەش دانانە) لە گوناهانی تر بۆ هەر کەس بیەوێت و شایستە بێت و(پەشیمان بێت) خۆش دەبێت، جا ئەوەی شەریک و هاوەڵ بۆ خوا بڕیار بدات، ئەوە بەڕاستی گومڕا بووە بەگومڕاییەکی زۆر دوور.

(١١٧) (ئەو هاوەڵگەرانە) ئەوەی هاناو هاواری بۆ دەبەن و دەیپەرستن ـ جگە لەخوا ـ چەند پەرستراوێکی کار تێکراون (پەرستراو دەبێت کارتێکەر بێت نەک کارتێکراو، بۆیە بتەکانیان بەمێینە ناونـاوە وەک : لات و عوززا)، تەنها هاناو هاواریشیان هەر بۆ شەیتانی سەرکەش و یاخییە کە لە هەموو خێرێک داماڵراوە.

(١١٨) ئەو شەیتانەی کە خوا نەفرینی لێکردووە و وتوویەتی: سوێند بێت بە تۆ ئەی خوا بەشێکی دیاریکراو لە بەندەکانت دائەبڕم لە ئیمان و خواناسی.

(١١٩) سوێند بێت بە تۆ گومڕایان دەکەم و بە ئاوات و خەیاڵی پووچەوە سەرگەرمیان دەکەم و خۆم فرمانیان پێدەدەم و هانیان دەدەم و ئەوجا ئەوانیش بێگومان گوێی ئاژەڵەکانیان دەبڕن، هەروەها فرمانیان پێ دەدەم ئەوانیش دروست کراوانی خوا دەستکاری بکەن و بیگۆڕن (لەم سەردەمەدا ئەڵقە لەگوێکانی بەناو زانا دەستکاریی جینات و سیفاتی ڕەچەڵەکیی دەکەن و بەگوێی شەیتان دەکەن، نادەمیزادو زیندەوەران تێکدەدەن، جگە لەهەندێکیان نەبێت کە مەبەستیان خزمەتی نادەمیزادە)، جا ئەوەی لە جیاتی خوا شەیتان بکاتە پشتیوانی خۆی، ئەوە بەڕاستی دووچاری زیان و خەسارەتمەندیەکی ئاشکرا بووە.

(١٢٠) (شەیتان) بەڵێنیان دەداتێ و ئاوات و ئارەزوو دەڕازێنێتەوە بۆیان، دیارە کە شەیتانیش هیچ بەڵێنێکیان پێنادات جگە لە فریودان و خەڵەتاندن نەبێت.

(١٢١) ئائەوانە جێگەو سەرەنجامیان دۆزەخە و کەلێنی لێ دەرچوونیان دەست ناکەوێت.

وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ سَنُدۡخِلُهُمۡ جَنَّٰتٖ تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَآ أَبَدٗاۖ وَعۡدَ ٱللَّهِ حَقّٗاۚ وَمَنۡ أَصۡدَقُ مِنَ ٱللَّهِ قِيلٗا ﴿١٢٢﴾ لَّيۡسَ بِأَمَانِيِّكُمۡ وَلَآ أَمَانِيِّ أَهۡلِ ٱلۡكِتَٰبِۗ مَن يَعۡمَلۡ سُوٓءٗا يُجۡزَ بِهِۦ وَلَا يَجِدۡ لَهُۥ مِن دُونِ ٱللَّهِ وَلِيّٗا وَلَا نَصِيرٗا ﴿١٢٣﴾ وَمَن يَعۡمَلۡ مِنَ ٱلصَّٰلِحَٰتِ مِن ذَكَرٍ أَوۡ أُنثَىٰ وَهُوَ مُؤۡمِنٞ فَأُوْلَٰٓئِكَ يَدۡخُلُونَ ٱلۡجَنَّةَ وَلَا يُظۡلَمُونَ نَقِيرٗا ﴿١٢٤﴾ وَمَنۡ أَحۡسَنُ دِينٗا مِّمَّنۡ أَسۡلَمَ وَجۡهَهُۥ لِلَّهِ وَهُوَ مُحۡسِنٞ وَٱتَّبَعَ مِلَّةَ إِبۡرَٰهِيمَ حَنِيفٗاۗ وَٱتَّخَذَ ٱللَّهُ إِبۡرَٰهِيمَ خَلِيلٗا ﴿١٢٥﴾ وَلِلَّهِ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلۡأَرۡضِۚ وَكَانَ ٱللَّهُ بِكُلِّ شَيۡءٖ مُّحِيطٗا ﴿١٢٦﴾ وَيَسۡتَفۡتُونَكَ فِي ٱلنِّسَآءِۖ قُلِ ٱللَّهُ يُفۡتِيكُمۡ فِيهِنَّ وَمَا يُتۡلَىٰ عَلَيۡكُمۡ فِي ٱلۡكِتَٰبِ فِي يَتَٰمَى ٱلنِّسَآءِ ٱلَّٰتِي لَا تُؤۡتُونَهُنَّ مَا كُتِبَ لَهُنَّ وَتَرۡغَبُونَ أَن تَنكِحُوهُنَّ وَٱلۡمُسۡتَضۡعَفِينَ مِنَ ٱلۡوِلۡدَٰنِ وَأَن تَقُومُواْ لِلۡيَتَٰمَىٰ بِٱلۡقِسۡطِۚ وَمَا تَفۡعَلُواْ مِنۡ خَيۡرٖ فَإِنَّ ٱللَّهَ كَانَ بِهِۦ عَلِيمٗا ﴿١٢٧﴾

(١٢٢) ئەوانەش باوەڕیان هێناوە و کارو کردەوە چاکەکانیان ئەنجامداوە، ئەوە لەمەودوا دەیانخەینە ناو باخەکانی بەهەشتەوە کە چەندەها رووبار بەژێر درەخت و بەبەردەم کۆشکەکانیدا دەڕوات و ژیانی هەمیشەیی و نەبڕاوە و بەردەوام تیایدا دەبەنەسەر، ئەوە بەڵێنێکی نەگۆڕاوی خواییە، جاکێ هەیە راستترو دروستتر لە خوا بەڵێنی خۆی بباتەسەر؟

(١٢٣) (پاداشت و رێزو نرخ) نە بە ئارەزووی ئێوەیە، نە بە ئارەزووی خاوەنانی کتێبە، ئەوەی خراپەو گوناهێک بکات، ئەوە بەهۆیەوە سزا دەدرێت و هیچ کەس و هیچ هێزێکی تری دەست ناکەوێت جگە لە خوا پشتگیریی بکات و یارمەتی بدات.

(١٢٤) ئەوەش کردەوە چاکەکان ئەنجام بدات نێر بێت یان مێ لەکاتێکدا ئیماندار بێت، جا ئەوانە دەچنە بەهەشتەوەو بەقەدەر پەردەی ناوکی خورما ستەمیان لێناکرێت.

(١٢٥) کێ هەیە ئاینی چاکترو پەسەندترو جوانتر بێت لەو کەسەی رووی کردۆتە خوا و خۆی تەسلیمی ئەوزاتە کردووەو لەکاتێکدا کارجوان و کار پەسەندەو شوێنی ئاینی ئیبراهیمی ملکەچ و فەرمانبەردار کەوتبێت، کە خوا ئیبراهیمی کردۆتە خۆشەویستی خۆی و رێزداری کردووە.

(١٢٦) هەرچی لە ئاسمانەکان و هەرچی لە زەویدا هەیە هەر خوا خاوەنیانەو دەسەڵاتی ئەو خوایە دەوری هەموو شتێکی داوە (بەوردیی و بەتەواویی لە هەموو شتێک ئاگادارە).

(١٢٧) ئەی محمد ﷺ پرسیارت لێدەکەن دەربارەی ئەوەی کە پێویستە پیاوان ئەنجامی بدەن بەرامبەر بە ژنان، پێیان بڵێ: خوای گەورە دەربارەیان وەڵامتان دەداتەوە؛ جائەوەی بەسەرتاندا دەخوێندرێتەوە لە قورئاندا (روونی کردۆتەوە لەمەوپێش لە سەرەتای ئەم سوورەتەوە) دەربارەی ئەو کچە بێ باوکانەی ئەوەی خوا بۆی دانـاون نایاندەنێ و ناشتانەوێت مارەیان بکەن و (رێگەش لە شووکردنیان دەگرن) و دەربارەی میراتی ئەو منداڵە بێ دەسەڵاتانەی ناتانەوێت بەدادپەروەری هەڵسوکەوت و مامەڵەیان لەگەڵدا بکەن و بەرپاکردنی دادگەریی لەنێوان بێ باوکاندا (ئەرکی سەرشانی ئیمانداران‌ە)، ئەوەی کە ئەنجامی دەدەن لە چاکە ئەوە بێگومان خوای گەورە پێی ئاگادارە بەچاکەکاریی لەگەڵ منداڵانی بێ باوکدا (کە مافیان بدەن و ستەمیان لێنەکەن)، جا هەر خێرو چاکەیەک ئەنجام بدەن خوا زانایە پێی.

وَإِنِ ٱمۡرَأَةٌ خَافَتۡ مِنۢ بَعۡلِهَا نُشُوزًا أَوۡ إِعۡرَاضًا فَلَا جُنَاحَ عَلَيۡهِمَآ أَن يُصۡلِحَا بَيۡنَهُمَا صُلۡحًاۚ وَٱلصُّلۡحُ خَيۡرٞۗ وَأُحۡضِرَتِ ٱلۡأَنفُسُ ٱلشُّحَّۚ وَإِن تُحۡسِنُواْ وَتَتَّقُواْ فَإِنَّ ٱللَّهَ كَانَ بِمَا تَعۡمَلُونَ خَبِيرٗا ﴿١٢٨﴾ وَلَن تَسۡتَطِيعُوٓاْ أَن تَعۡدِلُواْ بَيۡنَ ٱلنِّسَآءِ وَلَوۡ حَرَصۡتُمۡۖ فَلَا تَمِيلُواْ كُلَّ ٱلۡمَيۡلِ فَتَذَرُوهَا كَٱلۡمُعَلَّقَةِۚ وَإِن تُصۡلِحُواْ وَتَتَّقُواْ فَإِنَّ ٱللَّهَ كَانَ غَفُورٗا رَّحِيمٗا ﴿١٢٩﴾ وَإِن يَتَفَرَّقَا يُغۡنِ ٱللَّهُ كُلّٗا مِّن سَعَتِهِۦۚ وَكَانَ ٱللَّهُ وَٰسِعًا حَكِيمٗا ﴿١٣٠﴾ وَلِلَّهِ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلۡأَرۡضِۗ وَلَقَدۡ وَصَّيۡنَا ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡكِتَٰبَ مِن قَبۡلِكُمۡ وَإِيَّاكُمۡ أَنِ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَۚ وَإِن تَكۡفُرُواْ فَإِنَّ لِلَّهِ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلۡأَرۡضِۚ وَكَانَ ٱللَّهُ غَنِيًّا حَمِيدٗا ﴿١٣١﴾ وَلِلَّهِ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلۡأَرۡضِۚ وَكَفَىٰ بِٱللَّهِ وَكِيلًا ﴿١٣٢﴾ إِن يَشَأۡ يُذۡهِبۡكُمۡ أَيُّهَا ٱلنَّاسُ وَيَأۡتِ بِـَٔاخَرِينَۚ وَكَانَ ٱللَّهُ عَلَىٰ ذَٰلِكَ قَدِيرٗا ﴿١٣٣﴾ مَّن كَانَ يُرِيدُ ثَوَابَ ٱلدُّنۡيَا فَعِندَ ٱللَّهِ ثَوَابُ ٱلدُّنۡيَا وَٱلۡأٓخِرَةِۚ وَكَانَ ٱللَّهُ سَمِيعَۢا بَصِيرٗا ﴿١٣٤﴾

(١٢٨) ئەگەر ئافرەتێک لە لووت بەرزی یان پشت هەڵکردنی مێردەکەی ترسا، ئەوە هیچ گوناهیان لەسەر نیە و کارێکی چاکە: ئەگەر نێوان خۆیان چاک بکەن و لەسەر شێوازێک رێک بکەون (وەک ئەوەی ئافرەتەکە دەست هەڵگرێت لەهەندێ مافی خۆی تابەرێزو سەربەرزیەوە بمێنێتەوە لەگەڵ مێردەکەیدا) هەمیشە رێکەوتن و تەبایی شتێکی چاک و پەسەندە، هەرچەندە خەڵکی بە سروشت حەز بەرەزیلی دەکەن و تەنها بەرژەوەندی خۆیان دەوێت، (ئەگەر قیامەت و بەهەشت و دۆزەخ لەبەرچاو نەگیرێت) جا ئەگەر چاکەکارو رەفتارجوان بن (لەگەڵ هاوسەرانتاندا)و خاوەن تەقواو پارێزکار بن و ستەمیان لێ نەکەن، ئەوە دڵنیابن بەڕاستی خوا هەمیشەو بەردەوام ئاگایە بە کارو کردەوەتان.

(١٢٩) هەرگیز ئێوە ناتوانن لە نێوان هاوسەرەکانتاندا دادپەروەرانە رەفتار بکەن، لە کاتێکدا ئەگەر زۆریش سوور بن لەسەری، جا کەوابوو نەکەن هەر روو لە یەکێکیان بکەن بە تەواویی ئەوی تر واز لێبهێنن وەک هەڵپەسێرراو، نە ئەوەیە مێردار بێت، نە ئەوەشە بێ مێرد بێت، خۆ ئەگەر چاکسازی بکەن و رێک بکەون و خۆتان بپارێزن لە ستەم، ئەوە بەڕاستی خوا هەمیشەو بەردەوام لێخۆشبوو میهرەبانە.

(١٣٠) خۆ ئەگەر ژن و مێرد لێک جیاببنەوە (بەگوێرەی شەرع و بەرنامەی خوا) ئەوە خوا هەریەکەیان شادو بێنیازو بەختەوەر دەکات، لە بەخشینی فراوانی خۆی (بەهاوسەرێکی گونجاو) چونکە خوا هەمیشەو بەردەوام فراوانگیرو دانایە.

(١٣١) هەر بۆ خوایە ئەوەی لە ئاسمانەکان و ئەوەی لە زەویدایە، سوێند بەخوا بەڕاستی ئێمە ئامۆژگاری و فەرمانمانداوە بەسەر ئەوانەی بەرنامەی خوایان بۆ هاتبوو لە پێش ئێوە، هەروەها ئامۆژگاری ئێوەشمان کردووە لە خوا بترسن و بە تەقواو پارێزکاربن، خۆ ئەگەر بێ باوەڕو یاخی بن (ئەوە خۆتان زیان دەکەن)، چونکە بەڕاستی هەر بۆ خوایە ئەوەی لە ئاسمانەکان و ئەوەی لە زەویدایە، خوایش هەمیشەو بەردەوام بێ نیازەو شایستەی سوپاسە.

(١٣٢) هەر بۆ خوایە ئەوەی لە ئاسمانەکان و ئەوەی لە زەویدایە و هەر ئەو خوایە بەسە بۆ ئەوەی چاودێر بێت و کاروباری پێ بسپێریت (ئاسمانەکان هەر خوا خۆی فراوانییان دەزانێت و نهێنیەکانی زەویش کەمێکی زانراوە).

(١٣٣) خەڵکینە، ئەگەر خوا بیەوێت، ئێوە لەناو دەبات و کەسانی تر دەهێنێتە مەیدانەوە و خوا هەمیشە و بەردەوام دەسەڵاتی بەسەر ئەوکارەدا هەیە.

(١٣٤) ئەو کەسەی تەنها پاداشتی دنیای دەوێت (ئەوە بابزانێت) کە لای خوا پاداشتی دنیاو پاداشتی قیامەتیش هەیە، خوا هەمیشەو بەردەوام بیسەرو بینایە.



﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ كُونُوا۟ قَوَّٰمِينَ بِٱلْقِسْطِ شُهَدَآءَ لِلَّهِ وَلَوْ عَلَىٰٓ أَنفُسِكُمْ أَوِ ٱلْوَٰلِدَيْنِ وَٱلْأَقْرَبِينَ ۚ إِن يَكُنْ غَنِيًّا أَوْ فَقِيرًا فَٱللَّهُ أَوْلَىٰ بِهِمَا ۖ فَلَا تَتَّبِعُوا۟ ٱلْهَوَىٰٓ أَن تَعْدِلُوا۟ ۚ وَإِن تَلْوُۥٓا۟ أَوْ تُعْرِضُوا۟ فَإِنَّ ٱللَّهَ كَانَ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرًا ﴿١٣٥﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ ءَامِنُوا۟ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ وَٱلْكِتَٰبِ ٱلَّذِى نَزَّلَ عَلَىٰ رَسُولِهِۦ وَٱلْكِتَٰبِ ٱلَّذِىٓ أَنزَلَ مِن قَبْلُ ۚ وَمَن يَكْفُرْ بِٱللَّهِ وَمَلَٰٓئِكَتِهِۦ وَكُتُبِهِۦ وَرُسُلِهِۦ وَٱلْيَوْمِ ٱلْءَاخِرِ فَقَدْ ضَلَّ ضَلَٰلًۢا بَعِيدًا ﴿١٣٦﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ثُمَّ كَفَرُوا۟ ثُمَّ ءَامَنُوا۟ ثُمَّ كَفَرُوا۟ ثُمَّ ٱزْدَادُوا۟ كُفْرًا لَّمْ يَكُنِ ٱللَّهُ لِيَغْفِرَ لَهُمْ وَلَا لِيَهْدِيَهُمْ سَبِيلًۢا ﴿١٣٧﴾ بَشِّرِ ٱلْمُنَٰفِقِينَ بِأَنَّ لَهُمْ عَذَابًا أَلِيمًا ﴿١٣٨﴾ ٱلَّذِينَ يَتَّخِذُونَ ٱلْكَٰفِرِينَ أَوْلِيَآءَ مِن دُونِ ٱلْمُؤْمِنِينَ ۚ أَيَبْتَغُونَ عِندَهُمُ ٱلْعِزَّةَ فَإِنَّ ٱلْعِزَّةَ لِلَّهِ جَمِيعًا ﴿١٣٩﴾ وَقَدْ نَزَّلَ عَلَيْكُمْ فِى ٱلْكِتَٰبِ أَنْ إِذَا سَمِعْتُمْ ءَايَٰتِ ٱللَّهِ يُكْفَرُ بِهَا وَيُسْتَهْزَأُ بِهَا فَلَا تَقْعُدُوا۟ مَعَهُمْ حَتَّىٰ يَخُوضُوا۟ فِى حَدِيثٍ غَيْرِهِۦٓ ۚ إِنَّكُمْ إِذًا مِّثْلُهُمْ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ جَامِعُ ٱلْمُنَٰفِقِينَ وَٱلْكَٰفِرِينَ فِى جَهَنَّمَ جَمِيعًا ﴿١٤٠﴾

(١٣٥) ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە هەمیشە ڕاگری دادوەری بن و شایەتیی بۆ خوا بدەن، با شایەتیەکەشتان زیانی بۆ خۆتان و دایك و باوکتان یان خزمانیش هەبێت، ئەگەر کەسێك لەوانە دەوڵەمەندبێت یان هەژار خوا بەرژەوەندی ئەوان چاکتر دەزانێت لە ئێوە (واتە بەتەماعی دەوڵەمەندی لە دادپەروەری لامەدەن و بەهۆی نەداریی و بەزەیی بێ جێ لە حەق لامەدەن) نەکەن شوێن ئارەزووی نەفس بکەون لە دادپەروەری لابدەن، جا ئەگەر ئێوە پێچ لێ بدەن (زمان بگۆڕن) و شایەتی ناحەق بدەن، یان پشت هەڵکەن، ئەوە چاك بزانن خوا ئاگادارە بە کارو کردەوەتان.

(١٣٦) ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە، بەردەوام و دامەزراو بن لەسەر ئیمان بە خوا و پێغەمبەرەکەی و بەو قورئانەش کە لە ماوەی چەند ساڵێکدا دایبەزاندووە بۆ پێغەمبەرەکەی و بەو کتێبانەش کە پێشتر ڕەوانەی کردوون، جا ئەوەی باوەڕی نەبێت بەخواو بەفریشتەکانی و بە کتێبەکانی و بەپێغەمبەرانی و بەڕۆژی دوایی، ئەوە بەڕاستی گومڕابووە بەئەوپەڕی گومڕایی.

(١٣٧) بەڕاستی ئەوانەی باوەڕیان هێناوە و دوایی پاشگەز بوونەتەوە، دووبارە ئیمانیان هێنایەوە و دوایی پاشگەز بوونەوە، لەوەودوا زیاتر لە بێ دینی و کافریدا ڕۆچوون، هیچ کات خوا لەوانە خۆشنابێت و ڕێنموویان ناکات بۆ ڕێبازێکی سوود بەخش.

(١٣٨) (ئەی پێغەمبەرﷺ) مژدە بە دووڕووەکان بدە کە بەڕاستی سزایەکی بەئێشیان بۆ ئامادە کراوە!!

(١٣٩) ئەو دووڕووانەی کە بێ باوەڕەکان دەکەنە پشتیوان و یارویاوەری خۆیان لەجیاتی ئیمانداران، ئایا دەیانەوێت عیززەت و دەسەڵات و سەربەرزیان لای ئەوان دەست بکەوێت؟ (ئەوانە بەهەڵەدا چوون) چونکە بەڕاستی عیززەت و بالادەستی و سەربەرزیی هەر هەمووی بۆ خوایە.

(١٤٠) بەڕاستی (خوای گەورە) لە قورئاندا ئەم بڕیارەی ناردووە بۆ سەرتان کە: هەر کاتێك لە جێیەکدا گوێتان لێ بوو کوفرو گاڵتە بەئایەتەکانی خوا دەکرا، ئەوە دامەنیشن لەگەڵ ئەوانەدا هەتا قسەو باسەکەیان نەگۆڕن (ئەگەر دابنیشن و گوێ نەدەنێ) ئەوە بەڕاستی ئێوەش لەو کاتەدا وەك ئەوانن و (حسابی ئەوانتان بۆ دەکرێت) بەڕاستی خوا دووڕووەکان و بێ باوەڕەکان هەموویان لە دۆزەخدا کۆدەکاتەوە.

ٱلَّذِينَ يَتَرَبَّصُونَ بِكُمْ فَإِن كَانَ لَكُمْ فَتْحٌ مِّنَ ٱللَّهِ قَالُوٓا۟ أَلَمْ
نَكُن مَّعَكُمْ وَإِن كَانَ لِلْكَٰفِرِينَ نَصِيبٌ قَالُوٓا۟ أَلَمْ نَسْتَحْوِذْ
عَلَيْكُمْ وَنَمْنَعْكُم مِّنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ ۚ فَٱللَّهُ يَحْكُمُ بَيْنَكُمْ يَوْمَ
ٱلْقِيَٰمَةِ ۗ وَلَن يَجْعَلَ ٱللَّهُ لِلْكَٰفِرِينَ عَلَى ٱلْمُؤْمِنِينَ سَبِيلًا ﴿١٤١﴾
إِنَّ ٱلْمُنَٰفِقِينَ يُخَٰدِعُونَ ٱللَّهَ وَهُوَ خَٰدِعُهُمْ وَإِذَا قَامُوٓا۟ إِلَى
ٱلصَّلَوٰةِ قَامُوا۟ كُسَالَىٰ يُرَآءُونَ ٱلنَّاسَ وَلَا يَذْكُرُونَ ٱللَّهَ إِلَّا
قَلِيلًا ﴿١٤٢﴾ مُّذَبْذَبِينَ بَيْنَ ذَٰلِكَ لَآ إِلَىٰ هَٰٓؤُلَآءِ وَلَآ إِلَىٰ هَٰٓؤُلَآءِ ۚ
وَمَن يُضْلِلِ ٱللَّهُ فَلَن تَجِدَ لَهُۥ سَبِيلًا ﴿١٤٣﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟
لَا تَتَّخِذُوا۟ ٱلْكَٰفِرِينَ أَوْلِيَآءَ مِن دُونِ ٱلْمُؤْمِنِينَ ۚ أَتُرِيدُونَ
أَن تَجْعَلُوا۟ لِلَّهِ عَلَيْكُمْ سُلْطَٰنًا مُّبِينًا ﴿١٤٤﴾ إِنَّ ٱلْمُنَٰفِقِينَ
فِى ٱلدَّرْكِ ٱلْأَسْفَلِ مِنَ ٱلنَّارِ وَلَن تَجِدَ لَهُمْ نَصِيرًا ﴿١٤٥﴾
إِلَّا ٱلَّذِينَ تَابُوا۟ وَأَصْلَحُوا۟ وَٱعْتَصَمُوا۟ بِٱللَّهِ وَأَخْلَصُوا۟
دِينَهُمْ لِلَّهِ فَأُو۟لَٰٓئِكَ مَعَ ٱلْمُؤْمِنِينَ ۖ وَسَوْفَ يُؤْتِ ٱللَّهُ
ٱلْمُؤْمِنِينَ أَجْرًا عَظِيمًا ﴿١٤٦﴾ مَّا يَفْعَلُ ٱللَّهُ بِعَذَابِكُمْ
إِن شَكَرْتُمْ وَءَامَنتُمْ ۚ وَكَانَ ٱللَّهُ شَاكِرًا عَلِيمًا ﴿١٤٧﴾

(١٤١) ئەوانەی کە خۆیان بۆ ئێوە مەڵاسداوە چاوەڕوانی بەسەرهاتتان دەکەن، ئەگەر سەرکەوتنێکتان لەلایەن خواوە دەست بکەوێت دەڵێن: ئەی ئێمە لەگەڵتاندا نەبووین؟! خۆ ئەگەر کافرەکان بەشێکیان ببێت لە سەرکەوتن، دووڕووەکان دەڵێن: ئایا ئێمە لەسەر ئێوەمان نەدەکردەوە و، نەمانهێشت ئیمانداران زیانتان پێبگەیەنن، ئینجا خوا لە رۆژی قیامەتدا دادوەریی دەکات لە نێوانتاندا (ئەی بێ باوەڕ و دووڕووەکان) دڵنیابن هەرگیز خوا نایەڵێت بێ باوەڕان بەسەر ئیمانداراندا دەست رۆیشتوو بن و ریشەکەنیان بکەن.

(١٤٢) بەڕاستی دووڕووەکان (وا دەزانن) فێڵ لە خوا دەکەن (لەکاتێکدا) ئەو زاتە فێڵەکانیان پووچ دەکاتەوە (نازانن کە دیار و نادیار، لای خوا روون و ئاشکرایە)، هەر کاتێکیش (بۆ ریاو رووپامایی) هەڵدەستن بۆ نوێژ، زۆر بەلەش گرانیی و تەمەڵیی هەڵدەستن، ئەوانە ریایی و روپامایی بۆ خەڵکی دەکەن، زۆر کەم یادی خوا دەکەن.

(١٤٣) ئەوانە گیریان خواردووە لەو نێوانەدا، نەئەوەیە پاڵ بدەن بەئیماندارانەوە، نەئەوەشە پاڵ بدەن بەکافرانەوە، هەر کەس خوا (بەهۆی نالەباریی خۆیەوە) گومڕای بکات، ئەوە هەرگیز ناتوانیت رێبازێکی ڕاست و رزگاری بۆ بدۆزیتەوە.

(١٤٤) ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە بێ باوەڕان مەکەنە یارو یاوەری خۆتان لەجیاتی ئیمانداران، ئایا دەتانەوێت بە دەستی خۆتان بەڵگەیەکی ئاشکرا بدەنە دەست خوا لەسەر خۆتان.

(١٤٥) بەڕاستی دووڕووەکان لە چینی هەرە خواری ناو دۆزەخدان و هەرگیز بۆ ئەوان پشتیوانێکت دەست ناکەوێت.

(١٤٦) جگە لەوانەیان تەوبەی راستەقینەیان کردووە و کارونیەتیان چاک کردووە و دەستیان بەئاینی خواوە گرتووە و پەیڕەوی بەرنامەکەی دەکەن و بەتەواویی دین و ئاینیان ساغ کردۆتەوە بۆ خوا، جا ئەوانە لەگەڵ ئیمانداراندا دەبن و (لەگەڵ ئەواندا حەشر دەکرێن)، بێگومان لەئایندەدا خوا پاداشتی زۆرو بێ سنوور دەبەخشێت بەئیمانداران.

(١٤٧) خوا چ پێویستیەکی بەسزادانی ئێوە هەیە؟ ئەگەر شوکرانە بژێرو سوپاسگوزاربن و ئیمان و باوەڕی دامەزراوتان هەبێت، خوایش هەمیشەو بەردەوام سوپاسگوزاری بەندە چاکەکانیەتی و زاناو ئاگایە پێیان.



۞ لَّا يُحِبُّ ٱللَّهُ ٱلْجَهْرَ بِٱلسُّوٓءِ مِنَ ٱلْقَوْلِ إِلَّا مَن ظُلِمَ ۚ وَكَانَ ٱللَّهُ سَمِيعًا عَلِيمًا ﴿١٤٨﴾ إِن تُبْدُوا۟ خَيْرًا أَوْ تُخْفُوهُ أَوْ تَعْفُوا۟ عَن سُوٓءٍ فَإِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَفُوًّا قَدِيرًا ﴿١٤٩﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَكْفُرُونَ بِٱللَّهِ وَرُسُلِهِۦ وَيُرِيدُونَ أَن يُفَرِّقُوا۟ بَيْنَ ٱللَّهِ وَرُسُلِهِۦ وَيَقُولُونَ نُؤْمِنُ بِبَعْضٍ وَنَكْفُرُ بِبَعْضٍ وَيُرِيدُونَ أَن يَتَّخِذُوا۟ بَيْنَ ذَٰلِكَ سَبِيلًا ﴿١٥٠﴾ أُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْكَٰفِرُونَ حَقًّا ۚ وَأَعْتَدْنَا لِلْكَٰفِرِينَ عَذَابًا مُّهِينًا ﴿١٥١﴾ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ بِٱللَّهِ وَرُسُلِهِۦ وَلَمْ يُفَرِّقُوا۟ بَيْنَ أَحَدٍ مِّنْهُمْ أُو۟لَٰٓئِكَ سَوْفَ يُؤْتِيهِمْ أُجُورَهُمْ ۗ وَكَانَ ٱللَّهُ غَفُورًا رَّحِيمًا ﴿١٥٢﴾ يَسْـَٔلُكَ أَهْلُ ٱلْكِتَٰبِ أَن تُنَزِّلَ عَلَيْهِمْ كِتَٰبًا مِّنَ ٱلسَّمَآءِ ۚ فَقَدْ سَأَلُوا۟ مُوسَىٰٓ أَكْبَرَ مِن ذَٰلِكَ فَقَالُوٓا۟ أَرِنَا ٱللَّهَ جَهْرَةً فَأَخَذَتْهُمُ ٱلصَّٰعِقَةُ بِظُلْمِهِمْ ۚ ثُمَّ ٱتَّخَذُوا۟ ٱلْعِجْلَ مِنۢ بَعْدِ مَا جَآءَتْهُمُ ٱلْبَيِّنَٰتُ فَعَفَوْنَا عَن ذَٰلِكَ ۚ وَءَاتَيْنَا مُوسَىٰ سُلْطَٰنًا مُّبِينًا ﴿١٥٣﴾ وَرَفَعْنَا فَوْقَهُمُ ٱلطُّورَ بِمِيثَٰقِهِمْ وَقُلْنَا لَهُمُ ٱدْخُلُوا۟ ٱلْبَابَ سُجَّدًا وَقُلْنَا لَهُمْ لَا تَعْدُوا۟ فِى ٱلسَّبْتِ وَأَخَذْنَا مِنْهُم مِّيثَٰقًا غَلِيظًا ﴿١٥٤﴾

(١٤٨) بێگومان خوا حەز ناکات لە قسەی ناشیرین و نابەجێ و ناو و ناتۆرە وتن و جنێودان ، مەگەر کەسێک ستەم لێکراو بێت، خوا هەمیشەو بەردەوام بیسەرو زانایە.

(١٤٩) ئەگەر کردارو گوفتارو بەخششی خۆتان ئاشکرا بکەن یان بیشارنەوە، یاخود چاوپۆشی لە هەڵەو گوناهێک بکەن، ئەوە بێگومان خوا هەمیشەو بەردەوام لێخۆشبووە بەدەسەڵاتیشە.

(١٥٠) بێگومان ئەوانەی باوەڕ بە خواو پێغەمبەران ناهێنن و دەیانەوێت جیاوازی بکەن لە نێوان خواو پێغەمبەرەکانیدا (گوایە باوەڕیان بەخوا هەیە بەڵام باوەڕیان بەپێغەمبەران نیە)، (یاخود) دەڵێن: باوەڕ دەهێنین بەهەندێک لە پێغەمبەران و باوەڕ بەهەندێکیان ناهێنین و دەیانەوێت لەو نێوانەدا ڕێگە و بەرنامەیەک بۆ خۆیان بەدەست بهێنن...

(١٥١) ئا ئەو جۆرە کەسانە بەڕاستی هەر بێ باوەڕن و بۆ بێباوەڕان سزایەکی سەر شۆڕکەرمان ئامادەکردوە.

(١٥٢) ئەوانەی باوەڕیان بە خوا و پێغەمبەرەکانی هێناوە و هیچ جۆرە جیاوازیەکیان نەکردووە لە نێوان هیچ کامیانداو باوەڕیان بە هەموویان هەیە، ئا ئەوانە لەئایندەدا خوای گەورە پاداشتی خۆیان دەداتێ، خوای گەورەش هەمیشە و بەردەوام لێخۆشبوو میهرەبانە (بۆ باوەڕداران).

(١٥٣) ئەی محمد ﷺ خاوەنانی کتێب داوای ئەوەت لێدەکەن کە لە ئاسمانەوە کتێبێکیان بۆ دابەزێنیت، جا ئەوانە بەڕاستی داوای لەوە گەورەتریان لە موسا کرد، وتیان: دەمانەوێت خوامان بەئاشکرا نیشان بدەیت، ئەوسا هەورە بروسکەیەک لێیدان لە سەرئەنجامی ئەو ستەمە ناڕەوایەو (ئەو داخوازیە نادروستەیاندا) کەچی لەوەودوا گوێرەکە پەرستیانکرد لە دوای ئەو هەموو بەڵگە و موعجیزە ئاشکرایانە کە بۆیان هات، جا لەوەشیان خۆش بووین و بەڵگەو موعجیزە و بەرنامەی ئاشکرامان بەخشی بە موسا (تا ڕێنموویيان بکات).

(١٥٤) بۆ چەسپاندن و وەرگرتنی پەیمانەکە کێوی (طور) مان بەرز کردەوە بەسەریانداو پێمان وتن: کە لە دەروازەی شاری (قدس) ەوە بەسوژدەوە بچنە ژورەوە (هەروەها فرمانمانداو) وتمان: لە ڕۆژانی شەمواندا دەستدرێژی مەکەن و (ڕاوە ماسی مەکەن، بۆ ئەو مەبەستە) پەیمانێکی توندو بەهێزمان لێوەرگرتن.

فَبِمَا نَقْضِهِم مِّيثَٰقَهُمْ وَكُفْرِهِم بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ وَقَتْلِهِمُ ٱلْأَنۢبِيَآءَ بِغَيْرِ حَقٍّ وَقَوْلِهِمْ قُلُوبُنَا غُلْفٌۢ ۚ بَلْ طَبَعَ ٱللَّهُ عَلَيْهَا بِكُفْرِهِمْ فَلَا يُؤْمِنُونَ إِلَّا قَلِيلًا ﴿١٥٥﴾ وَبِكُفْرِهِمْ وَقَوْلِهِمْ عَلَىٰ مَرْيَمَ بُهْتَٰنًا عَظِيمًا ﴿١٥٦﴾ وَقَوْلِهِمْ إِنَّا قَتَلْنَا ٱلْمَسِيحَ عِيسَى ٱبْنَ مَرْيَمَ رَسُولَ ٱللَّهِ وَمَا قَتَلُوهُ وَمَا صَلَبُوهُ وَلَٰكِن شُبِّهَ لَهُمْ ۚ وَإِنَّ ٱلَّذِينَ ٱخْتَلَفُوا۟ فِيهِ لَفِى شَكٍّ مِّنْهُ ۚ مَا لَهُم بِهِۦ مِنْ عِلْمٍ إِلَّا ٱتِّبَاعَ ٱلظَّنِّ ۚ وَمَا قَتَلُوهُ يَقِينًۢا ﴿١٥٧﴾ بَل رَّفَعَهُ ٱللَّهُ إِلَيْهِ ۚ وَكَانَ ٱللَّهُ عَزِيزًا حَكِيمًا ﴿١٥٨﴾ وَإِن مِّنْ أَهْلِ ٱلْكِتَٰبِ إِلَّا لَيُؤْمِنَنَّ بِهِۦ قَبْلَ مَوْتِهِۦ ۖ وَيَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ يَكُونُ عَلَيْهِمْ شَهِيدًا ﴿١٥٩﴾ فَبِظُلْمٍ مِّنَ ٱلَّذِينَ هَادُوا۟ حَرَّمْنَا عَلَيْهِمْ طَيِّبَٰتٍ أُحِلَّتْ لَهُمْ وَبِصَدِّهِمْ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ كَثِيرًا ﴿١٦٠﴾ وَأَخْذِهِمُ ٱلرِّبَوٰا۟ وَقَدْ نُهُوا۟ عَنْهُ وَأَكْلِهِمْ أَمْوَٰلَ ٱلنَّاسِ بِٱلْبَٰطِلِ ۚ وَأَعْتَدْنَا لِلْكَٰفِرِينَ مِنْهُمْ عَذَابًا أَلِيمًا ﴿١٦١﴾ لَّٰكِنِ ٱلرَّٰسِخُونَ فِى ٱلْعِلْمِ مِنْهُمْ وَٱلْمُؤْمِنُونَ يُؤْمِنُونَ بِمَآ أُنزِلَ إِلَيْكَ وَمَآ أُنزِلَ مِن قَبْلِكَ ۚ وَٱلْمُقِيمِينَ ٱلصَّلَوٰةَ ۚ وَٱلْمُؤْتُونَ ٱلزَّكَوٰةَ وَٱلْمُؤْمِنُونَ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْءَاخِرِ أُو۟لَٰٓئِكَ سَنُؤْتِيهِمْ أَجْرًا عَظِيمًا ﴿١٦٢﴾

(١٥٥) ئینجا بەهۆی پەیمان شکاندنیان و بێ باوەڕیان بەئایەتەکانی خواو کوشتنی بەناحەقی پێغەمبەران لەلایەن ئەوانەوە و ئەو قسەیەشیان کە دەڵێن دڵی ئێمە داخراوە و بەرگی پێوەیە (مەبەستیان ئەوەیە کە ئامادەنین گوێ بۆ هیچ راستیەکێ بگرن، خوا خەشمی لێگرتن و نەفرینی لێکردن) نەخێر بەو جۆرە نیە کە ئەوانە دەیڵێن، بەڵکو خوا مۆری ناوە بەسەر دڵ و دەروونیاندا بەهۆی بێ‌باوەڕ بوونیانەوە، جا هەر بۆیە کەمێکیان نەبێت باوەڕناهێنن.

(١٥٦) (هەروەها خوا رقی لێیانە) بەهۆی بێ‌باوەڕ بوون و ئەو بوختانە گەورەیەی کە بۆ مەریەم هەڵیانبەست...

(١٥٧) بەهۆی ئەو قسەیەشیان کە دەیانوت بە راستی ئێمە مەسیح پێغەمبەری خوا عیسای کوڕی مەریەممان کوشتووە، کەچی لەراستیدا نەکوشتوویانەو نە لە قەنارەو خاچیانداوە، بەڵکو لێیان تێکچووە و (کەسێکی تریان کوشتووە لە بری ئەو)، بەڕاستی ئەوانەی کە بیرو بۆچوونی جیاوازیان لەو کێشەیەدا هەیە، خۆشیان لە گوماندان تیایدا و ئەوانە هیچ زانستیەکی راستیان نیە لەو بارەیەوە، جگە لە شوێنکەوتنی گومان نەبێت و بەدڵنیاییەوە (دەڵێین) کە نەیانکوشتووەو بۆیان نەکوژراوە.

(١٥٨) نەخێر، بەڵکو خوا بەرزی کردەوە بۆ لای خۆی، خوا هەمیشەو بەردەوام باڵادەست و دانایە.

(١٥٩) هیچ کەسێکێ نیە لە خاوەنانی کتێب، کە باوەڕ نەهێنێت بە عیسا پێش ئەوەی گیانی دەربچێت، بەڵکو سوێند بەخوا هەر باوەڕ دەهێنێت پێی لە پێش مردنیدا (لە سەرەمەرگدا پەردە لەسەر چاویان لادەدرێت و گەلێکێ راستی دەردەکەوێت بۆیان، یاخود کاتێکێ عیسا دادەبەزێت گاورو جووەکانی ئەو کاتە باوەڕی دروستی پێدەهێنن) و لە رۆژی قیامەتیشدا شایەتە بەسەریانەوە (کە ئەوانەی گومڕا بوون، خۆیان گومڕا بوون و ئەم کاتی خۆی هەر رێگەی راستی نیشانداون).

(١٦٠) بەهۆی زوڵم و ستەمێکێ لەلایەن ئەوانەی کە بوونەتە جوو و بەهۆی ئەوەی کە زۆر کۆسپیان دەخستە بەر رێبازی خوا، ئێمە هەندێکێ نازو نیعمەتمان لێ حەرام کردن کە پێشتر بۆیان حەڵاڵ بوو...

(١٦١) هەروەها بەهۆی سوو خۆریانەوە کە بەڕاستی لێیان حەرام کرابوو و بەهۆی ئەوەشەوە کە ماڵی خەڵکی بەناڕەوا دەخۆن (هەندێکێ شتی تری حەڵاڵمان لێ حەرام کردن)، بێگومان بۆ ئەوانەیان کە بێ باوەڕن سزایەکی بەئێشمان ئامادە کردووە.

(١٦٢) بەڵام ئەوانەیان کە لە زانستی و زانیاریدا رۆچوون، هەروەها ئیمانداران (لەوانیش و لەئێمەیش)، باوەڕ دەهێنن بەوەی بۆ تۆ رەوانەکراوە و بەوەش پێش تۆ رەوانە کراوە، بەتایبەت ئەوانەی کە بەچاکی نوێژەکانیان بەدروشمەکانەوە ئەنجام دەدەن و زەکاتیش دەدەن، باوەڕیشیان بەخواو بەرۆژی دوایی هەیە، ئا ئەوانە لە ئایندەیەکی نزیکدا پاداشتی گەورەو بێ‌سنووریان دەدەینەوە.



﴿إِنَّآ أَوْحَيْنَآ إِلَيْكَ كَمَآ أَوْحَيْنَآ إِلَىٰ نُوحٍ وَٱلنَّبِيِّـۧنَ مِنۢ بَعْدِهِۦ ۚ وَأَوْحَيْنَآ إِلَىٰٓ إِبْرَٰهِيمَ وَإِسْمَـٰعِيلَ وَإِسْحَـٰقَ وَيَعْقُوبَ وَٱلْأَسْبَاطِ وَعِيسَىٰ وَأَيُّوبَ وَيُونُسَ وَهَـٰرُونَ وَسُلَيْمَـٰنَ ۚ وَءَاتَيْنَا دَاوُۥدَ زَبُورًا ﴿١٦٣﴾ وَرُسُلًا قَدْ قَصَصْنَـٰهُمْ عَلَيْكَ مِن قَبْلُ وَرُسُلًا لَّمْ نَقْصُصْهُمْ عَلَيْكَ ۚ وَكَلَّمَ ٱللَّهُ مُوسَىٰ تَكْلِيمًا ﴿١٦٤﴾ رُّسُلًا مُّبَشِّرِينَ وَمُنذِرِينَ لِئَلَّا يَكُونَ لِلنَّاسِ عَلَى ٱللَّهِ حُجَّةٌۢ بَعْدَ ٱلرُّسُلِ ۚ وَكَانَ ٱللَّهُ عَزِيزًا حَكِيمًا ﴿١٦٥﴾ لَّـٰكِنِ ٱللَّهُ يَشْهَدُ بِمَآ أَنزَلَ إِلَيْكَ ۖ أَنزَلَهُۥ بِعِلْمِهِۦ ۖ وَٱلْمَلَـٰٓئِكَةُ يَشْهَدُونَ ۚ وَكَفَىٰ بِٱللَّهِ شَهِيدًا ﴿١٦٦﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ وَصَدُّوا۟ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ قَدْ ضَلُّوا۟ ضَلَـٰلًۢا بَعِيدًا ﴿١٦٧﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ وَظَلَمُوا۟ لَمْ يَكُنِ ٱللَّهُ لِيَغْفِرَ لَهُمْ وَلَا لِيَهْدِيَهُمْ طَرِيقًا ﴿١٦٨﴾ إِلَّا طَرِيقَ جَهَنَّمَ خَـٰلِدِينَ فِيهَآ أَبَدًا ۚ وَكَانَ ذَٰلِكَ عَلَى ٱللَّهِ يَسِيرًا ﴿١٦٩﴾ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ قَدْ جَآءَكُمُ ٱلرَّسُولُ بِٱلْحَقِّ مِن رَّبِّكُمْ فَـَٔامِنُوا۟ خَيْرًا لَّكُمْ ۚ وَإِن تَكْفُرُوا۟ فَإِنَّ لِلَّهِ مَا فِى ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۚ وَكَانَ ٱللَّهُ عَلِيمًا حَكِيمًا ﴿١٧٠﴾

(١٦٣) بەڕاستی ئێمە (وحی)و نیگامان(بۆ تۆ ناردووە هەر وەکو چۆن (وحی) و نیگامـان بۆ نوح و پێغەمبەرانی دوای ئەو ناردووە، هـەروەها (وحـی) و نیگامـان نـاردووە بـۆ ئیبراهیم و ئیسماعیل و ئیسحاق و یـەعقوب و (هـەندێک) لە کوڕانی یەعقوب و عیسا و ئەیوب و یونـس و هـاروون و سـولەیمان، زەبوریشـمان بـە داود بەخشیووە (کتێبێک بووە زۆربەی تەسـبیحات و ستایشی پەروەردگار بووە).

(١٦٤) بێگومـان بەسـەرهاتی هـەندێک لـە پێغەمبـەرانمان بـۆ گێڕاویتـەوە، بەسـەرهاتی هەندێکی تریشـمان بۆ نەگێڕاویتـەوە، بەڕاستی خوای گـەورە خۆی لەگـەڵ موسـادا گفتوگـۆی یەکسەری و ڕاستەوخۆی ئەنجامداوە.

(١٦٥) پێغەمبـەرانمان (ڕەوانـە کردووە) کـە مـژدەدەرن (بـە ئیمـانداران) و ترسـێنەرن بـۆ (یاخیـەکان)، تـا خـەڵکی هیـچ بەڵگەیـەکیان بەدەستەوە نەمێنێت (لەسەر بـێ دینـی و یـاخی بوونیـان) دوای ئـەوەی خـوا پێغەمبـەرانی بـۆ ڕەوانـە کـردوون، بێگـومـان هەمیشـەو بـەردەوام خوا بالادەست و دانایە.

(١٦٦) (ئەی محمد ﷺ، هەرچەندە ئەو خەڵکە باوەڕت پێناکەن) بەڵام خوا خۆی شـایەتە لەسـەر ئـەو قورئانـەی کـە ڕەوانـەی کـردووە بۆت، بـەئاگاداری و زانیـاری خۆیشی ڕەوانەی کردووە، فریشتەکانیش شایەتی دەدەن (لەسەر ئەوە، هەرچەندە) خوا خۆی بەسە بۆ ئەو شایەتییە.

(١٦٧) بەڕاستی ئەوانەی کە بـێ بـاوەڕ بـوون و ڕێبـازی بـێ باوەڕیـان گرتۆتەبـەر و بەربەستیشیان دانـا لـەبـەردەم ڕێبازی خوادا (بەشێنەیی و نەرم و نیانی)، بێگومان ئەوانە گومڕا بوون و لە ڕاستی زۆر دوور کەوتوونەتەوە.

(١٦٨) بەڕاستی ئەوانەی کە بێ باوەڕ بـوون و سـتەمیان کـردووە خـوا نەیویسـتووە لێیـان خـۆش بێت، هیدایـەت و ڕێنموێشیان بکات بۆ ڕێگە و ڕێبازێک (کە سوودی لێوەربگرن)...

(١٦٩) جگە لە ڕێگەی دۆزەخ کە دەیانگەیەنێتە نـاوی و ژیـانی نـەمریی بـەناچاریی دەبێـت تیـایدا بەرنەسـەر، ئـەو سزادانەشیان لای خوا زۆر ئاسانە (چونکە ئەوانە شایستەن).

(١٧٠) ئەی خەڵکینە بەڕاستی لەلایەن پەروەردگارتانەوە پێغەمبـەرێکتان بـۆ هـاتووە بەحـەق و ڕاسـتی، دە ئێـوەش ئیمان و باوەڕی پێ بهێنن، ئەوە چاکترە بۆتان، خۆ ئەگەر باوەڕ نەهێنن، ئەوە دڵنیابن کـە هـەرچی لـە ئاسمانـەکان و زەویدا هەیە هەر خوا خاوەنیانە (ئاتاجی ئیمانی ئێوە نیە)، چونکە خوا هەمیشەو بەردەوام زاناو دانایە.

يَٰٓأَهۡلَ ٱلۡكِتَٰبِ لَا تَغۡلُواْ فِي دِينِكُمۡ وَلَا تَقُولُواْ عَلَى ٱللَّهِ إِلَّا ٱلۡحَقَّۚ إِنَّمَا ٱلۡمَسِيحُ عِيسَى ٱبۡنُ مَرۡيَمَ رَسُولُ ٱللَّهِ وَكَلِمَتُهُۥٓ أَلۡقَىٰهَآ إِلَىٰ مَرۡيَمَ وَرُوحٞ مِّنۡهُۖ فَـَٔامِنُواْ بِٱللَّهِ وَرُسُلِهِۦۖ وَلَا تَقُولُواْ ثَلَٰثَةٌۚ ٱنتَهُواْ خَيۡرٗا لَّكُمۡۚ إِنَّمَا ٱللَّهُ إِلَٰهٞ وَٰحِدٞۖ سُبۡحَٰنَهُۥٓ أَن يَكُونَ لَهُۥ وَلَدٞۘ لَّهُۥ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلۡأَرۡضِۗ وَكَفَىٰ بِٱللَّهِ وَكِيلٗا ﴿١٧١﴾ لَّن يَسۡتَنكِفَ ٱلۡمَسِيحُ أَن يَكُونَ عَبۡدٗا لِّلَّهِ وَلَا ٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ ٱلۡمُقَرَّبُونَۚ وَمَن يَسۡتَنكِفۡ عَنۡ عِبَادَتِهِۦ وَيَسۡتَكۡبِرۡ فَسَيَحۡشُرُهُمۡ إِلَيۡهِ جَمِيعٗا ﴿١٧٢﴾ فَأَمَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ فَيُوَفِّيهِمۡ أُجُورَهُمۡ وَيَزِيدُهُم مِّن فَضۡلِهِۦۖ وَأَمَّا ٱلَّذِينَ ٱسۡتَنكَفُواْ وَٱسۡتَكۡبَرُواْ فَيُعَذِّبُهُمۡ عَذَابًا أَلِيمٗا وَلَا يَجِدُونَ لَهُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ وَلِيّٗا وَلَا نَصِيرٗا ﴿١٧٣﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ قَدۡ جَآءَكُم بُرۡهَٰنٞ مِّن رَّبِّكُمۡ وَأَنزَلۡنَآ إِلَيۡكُمۡ نُورٗا مُّبِينٗا ﴿١٧٤﴾ فَأَمَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ بِٱللَّهِ وَٱعۡتَصَمُواْ بِهِۦ فَسَيُدۡخِلُهُمۡ فِي رَحۡمَةٖ مِّنۡهُ وَفَضۡلٖ وَيَهۡدِيهِمۡ إِلَيۡهِ صِرَٰطٗا مُّسۡتَقِيمٗا ﴿١٧٥﴾

(١٧١) ئەی خاوەنانی کتێب زیادەڕەوی مەکەن لە ئاینەکەتاندا، جگە لە حەق و ڕاستی هیچی تر بە دەم خواوە مەڵێن، بەڕاستی مەسیح، عیسای کوڕی مەریەم جگە لەوەی کە فرستادەی خوایە (شتێکی تر نەبووە)، لە دایک بوونەکەی بەفەرمانی خوا بووە کەلە مەریەمدا (بەرجەستە بوو)، عیسا ڕۆح و گیانێکی (تایبەتیە) لەلایەن خواوە بەخشراوە، دە ئیتر باوەڕی دامەزراو بە خوایەتی خواو بەپێغەمبەرانی بهێنن، هەرگیز مەڵێن خوا سیانە (لەو گوفتارە نابەجێیە) واز بهێنن چاکترە و قازانجتانە، چونکە بەڕاستی خوا تەنها یەک تاکە خوایە، پاک و بێگەردو دوورە لەوەی کە منداڵی ببێت (بوختانی ناقۆڵای وا، چۆن دەکەن)؟! هەرچی لە ئاسمانەکان و هەرچی لە زەویدا هەیە هەر هەمووی ئەو خاوەنیانە، بێگومان خوا بەسە کە بەدیهێنەرو سەرپەرشتیاری(دروستکراوانی بێت)

(١٧٢) هەرگیز مەسیح لاری لەوە نیە کە بەندەی خوا بێت، هەروەها فریشتە نزیکەکانیش، جا ئەوەی لاری و سەرپێچی بکات لە پەرستنی خواو خۆی بەزل بزانێت، ئەوە (با دڵنیابێت هەمووان لە ئایندەدا لای ئەو زاتە دەبێت کۆببنەوە (بۆ لێپرسینەوە).

(١٧٣) (جا ئەو کاتە) ئەوانەی کە باوەڕیان هێناوە و کاروکردەوە چاکەکانیان ئەنجامداوە، ئەوە خوا بە تەواوی و بەچاکی پاداشتەکانیان دەداتەوە و لە فەزڵ و بەخششی تایبەتی خۆی بۆیان زیادیش دەکات، بەڵام ئەوانەی سەرپێچی و لاریان کردووە و خۆیان بەزل زانیووە، ئەوە خوا سزای زۆر بەئێشیان دەدات، ئەوسا بێجگە لە خوا کەسێکیان دەست ناکەوێت کە پشتیوانیان لێ بکات و سەریان بخات (ئەڵبەتە ئەو زاتەش بەزەیی پیایاندا نایەتەوە).

(١٧٤) ئەی خەڵکینە بەڕاستی لە لایەن پەروەردگارتانەوە بەڵگەو نیشانەی ئاشکراتان بۆ هاتووە (کە محمد پێغەمبەرە ﷺ )و نوورو ڕووناکیەکی ئاشکراشمان بۆ دابەزاندوون (کە قورئان)ە.

(١٧٥) جا ئەوانەی باوەڕیان بەخوا هێناوە و شوێنی بەرنامەکەی کەوتوون، ئەوە لە ئایندەیەکی نزیکدا خوا دەیانخاتە ژێر سایەی فەزڵ و ڕەحمەتی تایبەتی خۆیەوە و هیدایەت و ڕێنموویان دەکات بۆ لای خۆی لە ڕێگەی ڕێبازێکی ڕاست و دروستەوە.

يَسْتَفْتُونَكَ قُلِ ٱللَّهُ يُفْتِيكُمْ فِى ٱلْكَلَٰلَةِ ۚ إِنِ ٱمْرُؤٌا۟ هَلَكَ لَيْسَ لَهُۥ وَلَدٌ وَلَهُۥٓ أُخْتٌ فَلَهَا نِصْفُ مَا تَرَكَ ۚ وَهُوَ يَرِثُهَآ إِن لَّمْ يَكُن لَّهَا وَلَدٌ ۚ فَإِن كَانَتَا ٱثْنَتَيْنِ فَلَهُمَا ٱلثُّلُثَانِ مِمَّا تَرَكَ ۚ وَإِن كَانُوٓا۟ إِخْوَةً رِّجَالًا وَنِسَآءً فَلِلذَّكَرِ مِثْلُ حَظِّ ٱلْأُنثَيَيْنِ ۗ يُبَيِّنُ ٱللَّهُ لَكُمْ أَن تَضِلُّوا۟ ۗ وَٱللَّهُ بِكُلِّ شَىْءٍ عَلِيمٌۢ ﴿١٧٦﴾

سُورَةُ المَائدَة

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ أَوْفُوا۟ بِٱلْعُقُودِ ۚ أُحِلَّتْ لَكُم بَهِيمَةُ ٱلْأَنْعَٰمِ إِلَّا مَا يُتْلَىٰ عَلَيْكُمْ غَيْرَ مُحِلِّى ٱلصَّيْدِ وَأَنتُمْ حُرُمٌ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ يَحْكُمُ مَا يُرِيدُ ﴿١﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَا تُحِلُّوا۟ شَعَٰٓئِرَ ٱللَّهِ وَلَا ٱلشَّهْرَ ٱلْحَرَامَ وَلَا ٱلْهَدْىَ وَلَا ٱلْقَلَٰٓئِدَ وَلَآ ءَآمِّينَ ٱلْبَيْتَ ٱلْحَرَامَ يَبْتَغُونَ فَضْلًا مِّن رَّبِّهِمْ وَرِضْوَٰنًا ۚ وَإِذَا حَلَلْتُمْ فَٱصْطَادُوا۟ ۚ وَلَا يَجْرِمَنَّكُمْ شَنَـَٔانُ قَوْمٍ أَن صَدُّوكُمْ عَنِ ٱلْمَسْجِدِ ٱلْحَرَامِ أَن تَعْتَدُوا۟ ۘ وَتَعَاوَنُوا۟ عَلَى ٱلْبِرِّ وَٱلتَّقْوَىٰ ۖ وَلَا تَعَاوَنُوا۟ عَلَى ٱلْإِثْمِ وَٱلْعُدْوَٰنِ ۚ وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ ۖ إِنَّ ٱللَّهَ شَدِيدُ ٱلْعِقَابِ ﴿٢﴾

(١٧٦) ئـەی محمـد ﷺ داوای فتـوات لێدەكـەن دەربارەی (كلالە) كە بریتی‌یە: لە كەسێك باوك و نـەوەی نـەبێت، تـۆش بڵـێ: خـوا وەڵامتـان دەداتـەوە لـەو بارەیـەوە، ئەگـەر كەسـێك (پیاوێك) وەفـاتی كـردو منداڵی نـەبوو، هـەر تەنـها خوشـكێكی هـەبوو، ئـەوە نیـوەی سامانەكەی بۆ ئەوە (نیوەكەی تریشی دەخرێتە دارایی گشتی‌یەوە ئەگەر هەبێت و ئەگەر نەبوو لە بەرژەوەندیـەكی گشـتیدا بـەكار دەهێـنرێت)، (بەڵام ئەگەرمردووەكە ئافرەت بوو) ئەوا براكەی هـەموو میراتیەكـەی دەبات، ئەگـەر ئافرەتەكـە منداڵی لەدوا بەجێ نەمابوو، (خۆ ئەگـەر پیاوە مردووەكـە) دوو خوشـكی لـە دوا بـەجێ مـابوو ئـەوە دووبـەش لـە سـێ بەشـی ئـەوەی بـەجێی هێشتووە بۆ ئەوان دەبێت، خۆ ئەگەر مـیراتگران پیاوان و ئافرەتان بوون هەموویشیان لـە خوشـك و برا پێكهاتبوون ئەوە بۆ نێرینەیەكیان ئەندازەی بەشی دوو مێینـە هەیـە، خـوای گـەورە ئـەم شتانەتان بۆ روون دەكاتـەوە نـەوەكو سـەرگەردان ببن، خوای گەورەش بە هەموو شتێك زانایە.

سوورەتی (المـائدة)

بەناوی خوای بەخشندە و میهرەبان

(١) ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە، بەئەمەك و بـەوەفا بـن بەرامبـەر بـەڵێن و پەیمانـەكانتان، (خواردنـی گۆشـتی) ماڵات (مەڕو بزن و گاو وشتر) بۆتان حەڵاڵ كراوە، بێجگە لەوانەی كە بەسەرتاندا دەخوێنرێتەوە (لـەم سـوورەتەدا)، لەكاتێكدا راوتان بۆ حەڵاڵ نیە كە لە ئیحرامدان، (ئەم سـنوورانە فـەرمانی خوایـە) بەڕاسـتی خـوای گـەورە فـەرمان دەدات بە هەر شتێك كە بیەوێت.

(٢) ئـەی ئەوانـەی باوەڕتـان هێنـاوە دەسـتكاری دروشـمـەكانی خـوا مەكـەن و هـەڵی مەوەشـێننەوە (بەتایبـەت دروشمەكانی حەج و عـەمرە) هەروەها مانگەكانی حەرام (كە: رجب، ذوالقعدة، ذوالحجة، محرم) ن ، تێكـی مـەدەن و ئەو قوربانیەش كە دەكرێت (مەرجەكانی مەشێوێنن) و ئەو ملوانكانەی (دەكرێتـە ملـی ئـاژەڵ، كـە نیشـانەیە بـۆ ئەوەی خاوەنیان بڕیاریداوە بكرێن بەقوربانی) لێی مەكەنەوە و رێگە لەوانە مـەگرن كـە دێـن بـۆ (طواف)ی كەعبـەو لەكاتێكدا بەئومێدی فەزڵ و رەزامەندی خـوان، كـاتێك ئیحـرام دەشـكێنن، ئـەوە بۆتـان هەیـە راو بكـەن، هـەروەها دوژمنایەتی و رقەبەرایەتی كەسانێك كە نەیانهێشت كاتی خۆی ( طواف ) ی كەعبە بكەن، مەكەنە هۆی دەستدرێژی و بەرپاكردنی ناخۆشی، یارمەتی و كۆمەكیی یەكتر بكەن لەسەر چاكەو خواناسی، نەكەن یارمـەتی وكۆمـەكی یـەكتر بكەن لەسەر گوناهو دەستدرێژی، لە خوا بترسن و پارێزكار بن، چونكە بەڕاستی خوا زۆر بەتوندی تۆڵە دەسێنێت.

حُرِّمَتْ عَلَيْكُمُ الْمَيْتَةُ وَالدَّمُ وَلَحْمُ الْخِنزِيرِ وَمَا أُهِلَّ لِغَيْرِ اللَّهِ بِهِ وَالْمُنْخَنِقَةُ وَالْمَوْقُوذَةُ وَالْمُتَرَدِّيَةُ وَالنَّطِيحَةُ وَمَا أَكَلَ السَّبُعُ إِلَّا مَا ذَكَّيْتُمْ وَمَا ذُبِحَ عَلَى النُّصُبِ وَأَن تَسْتَقْسِمُوا بِالْأَزْلَامِ ذَٰلِكُمْ فِسْقٌ الْيَوْمَ يَئِسَ الَّذِينَ كَفَرُوا مِن دِينِكُمْ فَلَا تَخْشَوْهُمْ وَاخْشَوْنِ الْيَوْمَ أَكْمَلْتُ لَكُمْ دِينَكُمْ وَأَتْمَمْتُ عَلَيْكُمْ نِعْمَتِي وَرَضِيتُ لَكُمُ الْإِسْلَامَ دِينًا فَمَنِ اضْطُرَّ فِي مَخْمَصَةٍ غَيْرَ مُتَجَانِفٍ لِّإِثْمٍ فَإِنَّ اللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ (٣) يَسْأَلُونَكَ مَاذَا أُحِلَّ لَهُمْ قُلْ أُحِلَّ لَكُمُ الطَّيِّبَاتُ وَمَا عَلَّمْتُم مِّنَ الْجَوَارِحِ مُكَلِّبِينَ تُعَلِّمُونَهُنَّ مِمَّا عَلَّمَكُمُ اللَّهُ فَكُلُوا مِمَّا أَمْسَكْنَ عَلَيْكُمْ وَاذْكُرُوا اسْمَ اللَّهِ عَلَيْهِ وَاتَّقُوا اللَّهَ إِنَّ اللَّهَ سَرِيعُ الْحِسَابِ (٤) الْيَوْمَ أُحِلَّ لَكُمُ الطَّيِّبَاتُ وَطَعَامُ الَّذِينَ أُوتُوا الْكِتَابَ حِلٌّ لَّكُمْ وَطَعَامُكُمْ حِلٌّ لَّهُمْ وَالْمُحْصَنَاتُ مِنَ الْمُؤْمِنَاتِ وَالْمُحْصَنَاتُ مِنَ الَّذِينَ أُوتُوا الْكِتَابَ مِن قَبْلِكُمْ إِذَا آتَيْتُمُوهُنَّ أُجُورَهُنَّ مُحْصِنِينَ غَيْرَ مُسَافِحِينَ وَلَا مُتَّخِذِي أَخْدَانٍ وَمَن يَكْفُرْ بِالْإِيمَانِ فَقَدْ حَبِطَ عَمَلُهُ وَهُوَ فِي الْآخِرَةِ مِنَ الْخَاسِرِينَ (٥)

(٣) لەسەرتان حەرام کراوە خواردنی گۆشتی مردارەوە بوو، خوێن، گۆشتی بەراز، هەروەها ئەو ماڵاتەش کە سەر دەبڕدرێن و ناوی غەیری خوای لەسەر دەبرێت و ماڵاتی خنکاویش، ئەوەش کە بە ئازارو لێدان مردار بۆتەوە، ئەوەش کە دەکەوێتە خوارەوە، ئەوەش کە بەلێدانی ماڵاتێکی تر مردار بوو بێتەوە، ئەوانەش کە درندە پەلاماری دابن و لێی خواردبن مەگەر فریای چەقۆ کەوتبن، (هەر حاڵەتێک لەوانەی باسکرا ئەگەر بە چەقۆدا بگات حەڵاڵە)، هەروەها حەرام کراوە خواردنی گۆشتی ئەو ماڵاتانەی لەو شوێنانەدا سەر دەبڕدرێن کە هاناو هاواری بۆ غەیری خوا تێدا دەبرێت، هەروەها حەرامە لەسەرتان داوا کردنی چارەنووستان بەهۆی (الأزلام) وە، وەکو ئەو شتانەی کە لە ڕێگەی هەڵدانی زارەوە دەست بکەوێت و فاڵگرتنەوە، بورجەکان، قاوە گرتنەوە، ...هتد) ئەو جۆرە کردارو رەفتارانەتان سەرپێچی و دەرچوونە لە (فەرمانی خوا)، جا ئەمڕۆ (کە ڕۆژی عەرەفەیە) کافران نائومێد بوون لە دین و ئاینی ئێوە (ئیتر ناتوانن زاڵ بن بەسەرتانداو هەرگیز نووری خوایان بۆ ناکوژێتەوە) کەواتە لەوانە مەترسن، بەڵکو هەر لە من بترسن، ئەمڕۆ ئاین و بەرنامەکەتانم بەکۆتایی گەیاندو نازو نیعمەتی خۆمم بۆ تەواو کردن و ڕازیم بەوەی کە ئیسلام ببێتە بەرنامەو دین و ئاینتان (جا لەگەڵ بڕیاردانی ئەو شتانەدا کە حەراممان کردووە) هەر کەس ناچار کرا لە گرانیی و برسێتیدا (مەترسی ئەوەی هەبوو بمرێت) دەتوانێت لەو شتانە بخوات کە حەراممان کردووە (بەمەرجێک دەست درێژکار نەبێت و بەئارەزوو ژەمی زۆری لێ نەخوات)و خۆی تووشی گوناهو تاوان نەکات، ئەوە بەڕاستی خوا لێخۆشبووەو میهرەبانە (بۆ ئەو جۆرە حاڵەتانە).

(٤) ئەی محمد ﷺ پرسیارت لێدەکەن چی حەڵاڵکراوە بۆیان؟ پێیان بڵێ: هەرچی خۆراکی چاک و پاکە بۆتان حەڵاڵ کراوە، ئەوەش باڵندەو تانجی شکاری بۆتان ڕاو دەکەن و فێرتان کردوون (بێگومان خوا توانای بەخشیووە بە مرۆڤ بتوانێت مەشق بکات بەگیانداران و فێریان بکات ڕاوی بۆ بکەن بەتایبەتی تانجی)، دە بخۆن لەوەی بۆتان دەگرن و ناوی خوای لێ بهێنن کاتێک بەڕەڵای دەکەن و کاتێک لێی دەخۆن، هەر لە خوایش بترسن و پارێزکاربن (ئەی ڕاوچییەکان)، بەڕاستی خوا بەخێرایی لێپرسینەوە ئەنجام دەدات (ووردو درشتی کردارو رەفتار فەرامۆش ناکات).

(٥) لەمڕۆوە هەرچی خۆراکی چاک و پاکە بۆتان حەڵاڵ کراوە و خواردنی ئەوانەی کە کتێبی ئاسمانیان پێدراوە بۆتان حەڵاڵە، خواردەمەنی ئێوەش حەڵاڵە بۆ ئەوان، ئافرەتانی داوێن پاک لە ئیمانداران و ئافرەتانی داوێن پاک لەوانەی کتێبیان پێدراوە پێش ئێوە (بۆتان حەڵاڵە) کاتێک مارەییان پێبدەن، بەمەرجێک ئێوە پاک داوێن بن و داوێن پیس نەبن بەئاشکراو دوورە پەرێز بن لە دۆست گرتنی نهێنی بۆ داوێن پیسی، جا ئەوەی بێ باوەڕ بێت بەشەرعی خواو لەم حەرامانە خۆی نەپارێزێت، ئەوە ئیتر هەموو کارو کردەوە چاکەکانیشی پووچ دەبێتەوە و ئەو جۆرە کەسانە لە قیامەتدا لە ڕیزی خەسارەتمەندو زەرەرمەندو دۆڕاوەکاندان.

يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا قُمۡتُمۡ إِلَى ٱلصَّلَوٰةِ فَٱغۡسِلُواْ وُجُوهَكُمۡ وَأَيۡدِيَكُمۡ إِلَى ٱلۡمَرَافِقِ وَٱمۡسَحُواْ بِرُءُوسِكُمۡ وَأَرۡجُلَكُمۡ إِلَى ٱلۡكَعۡبَيۡنِۚ وَإِن كُنتُمۡ جُنُبٗا فَٱطَّهَّرُواْۚ وَإِن كُنتُم مَّرۡضَىٰٓ أَوۡ عَلَىٰ سَفَرٍ أَوۡ جَآءَ أَحَدٞ مِّنكُم مِّنَ ٱلۡغَآئِطِ أَوۡ لَٰمَسۡتُمُ ٱلنِّسَآءَ فَلَمۡ تَجِدُواْ مَآءٗ فَتَيَمَّمُواْ صَعِيدٗا طَيِّبٗا فَٱمۡسَحُواْ بِوُجُوهِكُمۡ وَأَيۡدِيكُم مِّنۡهُۚ مَا يُرِيدُ ٱللَّهُ لِيَجۡعَلَ عَلَيۡكُم مِّنۡ حَرَجٖ وَلَٰكِن يُرِيدُ لِيُطَهِّرَكُمۡ وَلِيُتِمَّ نِعۡمَتَهُۥ عَلَيۡكُمۡ لَعَلَّكُمۡ تَشۡكُرُونَ ﴿٦﴾ وَٱذۡكُرُواْ نِعۡمَةَ ٱللَّهِ عَلَيۡكُمۡ وَمِيثَٰقَهُ ٱلَّذِي وَاثَقَكُم بِهِۦٓ إِذۡ قُلۡتُمۡ سَمِعۡنَا وَأَطَعۡنَاۖ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمُۢ بِذَاتِ ٱلصُّدُورِ ﴿٧﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ كُونُواْ قَوَّٰمِينَ لِلَّهِ شُهَدَآءَ بِٱلۡقِسۡطِۖ وَلَا يَجۡرِمَنَّكُمۡ شَنَـَٔانُ قَوۡمٍ عَلَىٰٓ أَلَّا تَعۡدِلُواْۚ ٱعۡدِلُواْ هُوَ أَقۡرَبُ لِلتَّقۡوَىٰۖ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَۚ إِنَّ ٱللَّهَ خَبِيرُۢ بِمَا تَعۡمَلُونَ ﴿٨﴾ وَعَدَ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ لَهُم مَّغۡفِرَةٞ وَأَجۡرٌ عَظِيمٞ ﴿٩﴾

(٦) ئەی ئەوانــەی باوەڕتـان هێنـاوە: كـاتێك ویستتان هەستن بۆ نوێـژ (پێش ئـەوە دەست نوێـژ بگـرن، بـەم شـێوەیە): ئـەوە سـەرەتا رووخسارتان بشۆن، ئینجا دەستەكانتان لەگـەڵ ئەنیشكتاندا، پاشان دەستی تەڕ بهێنن بەسـەر سـەرتاندا، قاچەكانیشـتان بشـۆن لەگـەڵ قولـە پێتاندا، ئەگەر لەشتان گران بوو، ئەوە خۆتـان خاوێن بكـەن و خۆتـان بشـۆن، ئەگـەر نـەخۆش بوون یان لە سەفەردا بوون یـان دەسـتان بـەئاو گەیاندبوو (تارەتتان گرتبوو) یـان لـە ئـافرەتی (نامـەحرەم) كـەوتبوون و ئاوتـان دەسـت نەدەكـەوت (بـۆ خۆشـتن یـان بـۆ دەسـتنوێژ، ئەوكاتە دەتوانن) بـە خـاكێكی پـاك تەیـەموم بكـەن (واتـە لـەپی دەسـتان بەئاستەم بمـاڵن بەخاكدا)و بیهێنن بە رووخسارو دەستاندا (تا ئانیشكتان)، خوا نایـەوێت لـە ئـایندا تووشی سەغڵەتی و نارەحەتیتان بكات بەڵكو دەیەوێت پـاك و خاوێنتـان بكـات (لـە رواڵـەت و ناوەرۆكدا) و دەیەوێت نـازو نیعمـەتی خۆیتـان بەسەردا تەواوبكات بۆ ئەوەی سوپاسگوزار بن.

(٧) یادی نازو نیعمەتی خوا بكەنەوە لەسەرتان، هەروەها ئەو پەیمانـەش كـە پێویسـتە ئێـوە پابـەندی بـن، لـە بیرتان نەچێت كە وتوتانە: گوێڕایەڵ و ملكـەچ و فەرمانبـەرداریـن (كەواتـە ئیتر هەمیشـە و بـەردەوام) لـە خـوا بترسن و پارێزكار بن، چونكە خوا زانایە بەنهێنی دڵ و دەروونەكان.

(٨) ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە، زۆر بەچاكی هەستن بەئەنجامدانی شـایەتی دادپەروەرانـە لەبـەر خـوا، رق و دوژمنایەتی هیچ كەس و هیچ لایەك هەڵتان نەنێت كەلە دادپەروەریی لابـدەن، دادپـەروەربن، ئـەوە نزیكـترە لـە تەقواو خواناسیەوە، دەی كەواتە لەخوا ترس و پارێزكاربن، چونكە بەڕاستی خوا ئاگـادارە بەو كارو كردەوەیەی كە دەیكەن.

(٩) خوا بەڵێنی داوە بەوانەی باوەڕیان هێناوەو كردەوە چاكەكانیان ئەنجامداوە بە لێخۆشبوون و چاوپۆشی (لـە هەڵەو گوناهەكانیان) و پاداشتی گەورەو بێ سنوور بۆ ئەوانە.

وَٱلَّذِينَ كَفَرُواْ وَكَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِنَآ أُوْلَٰٓئِكَ أَصۡحَٰبُ ٱلۡجَحِيمِ ﴿١٠﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱذۡكُرُواْ نِعۡمَتَ ٱللَّهِ عَلَيۡكُمۡ إِذۡ هَمَّ قَوۡمٌ أَن يَبۡسُطُوٓاْ إِلَيۡكُمۡ أَيۡدِيَهُمۡ فَكَفَّ أَيۡدِيَهُمۡ عَنكُمۡۖ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَۚ وَعَلَى ٱللَّهِ فَلۡيَتَوَكَّلِ ٱلۡمُؤۡمِنُونَ ﴿١١﴾ ۞ وَلَقَدۡ أَخَذَ ٱللَّهُ مِيثَٰقَ بَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ وَبَعَثۡنَا مِنۡهُمُ ٱثۡنَيۡ عَشَرَ نَقِيبٗاۖ وَقَالَ ٱللَّهُ إِنِّي مَعَكُمۡۖ لَئِنۡ أَقَمۡتُمُ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتَيۡتُمُ ٱلزَّكَوٰةَ وَءَامَنتُم بِرُسُلِي وَعَزَّرۡتُمُوهُمۡ وَأَقۡرَضۡتُمُ ٱللَّهَ قَرۡضًا حَسَنٗا لَّأُكَفِّرَنَّ عَنكُمۡ سَيِّـَٔاتِكُمۡ وَلَأُدۡخِلَنَّكُمۡ جَنَّٰتٖ تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُۚ فَمَن كَفَرَ بَعۡدَ ذَٰلِكَ مِنكُمۡ فَقَدۡ ضَلَّ سَوَآءَ ٱلسَّبِيلِ ﴿١٢﴾ فَبِمَا نَقۡضِهِم مِّيثَٰقَهُمۡ لَعَنَّٰهُمۡ وَجَعَلۡنَا قُلُوبَهُمۡ قَٰسِيَةٗۖ يُحَرِّفُونَ ٱلۡكَلِمَ عَن مَّوَاضِعِهِۦ وَنَسُواْ حَظّٗا مِّمَّا ذُكِّرُواْ بِهِۦۚ وَلَا تَزَالُ تَطَّلِعُ عَلَىٰ خَآئِنَةٖ مِّنۡهُمۡ إِلَّا قَلِيلٗا مِّنۡهُمۡۖ فَٱعۡفُ عَنۡهُمۡ وَٱصۡفَحۡۚ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلۡمُحۡسِنِينَ ﴿١٣﴾

(١٠) ئەوانەش کە ڕێبازی کوفریان گرتۆتەبەرو بڕوایان بەئایەتەکانی ئێمە نەهێناوە، ئا ئەوانە نیشتەجێی ناو ئاگری دۆزەخن.

(١١) ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە یادی نازو نیعمەتی خوا بکەنەوە لەسەرتان کاتێک هەندێک ویستیان دەستدرێژی بکەنە سەرتان، خوایش دەستدرێژیەکەی ڕاگرتن و (ئێوەی پاراست)، دەی کەواتە لە خوا بترسن و پارێزکار بن، دەبا ئیمانداران هەر پشت بەخوا ببەستن (تا هەمیشە فریایان بکەوێت و لە پیلانی دوژمنان بیانپارێزێت).

(١٢) سوێند بێت بێگومان (کاتی خۆی) خوا پەیمانی لە نەوەی ئیسرائیل وەرگرت و دوانزە ڕابەرمان تیادا هەڵبژاردن، ئینجا خوا پێی فەرموون کە: من بەڕاستی لەگەڵتاندام، سوێند بێت بە خوا ئەگەر نوێژەکانتان بەچاکی ئەنجام بدەن و زەکات بدەن و باوەڕبهێنن بە هەموو پێغەمبەرانی من و پشتیوانییان لێبکەن، قەرزی چاک و جوان و ڕێک و پێک بدەن بەخەڵکی لەبەر خوا (لەبەر ڕەزامەندیی ئەوزاتە هەموو چاکەیەک ئەنجام بدەن و چاوەڕێی پاداشت لەوبن) ئەوە بێگومان لە گوناهو هەڵەکانتان خۆشدەبم و چاوپۆشیتان لێدەکەم و دەتانخەمە باخەکانی بەهەشتەوە کە چەندەها ڕووبار بەژێر درەختاکانیدا دەڕوات، جا ئەوەی لەوەودوا بێ باوەڕ بێت لە ئێوە، ئەوە مانای وایە کە بەڕاستی ڕێگەو ڕێبازی ڕاست و ڕەوانی لێ تێکچووە.

(١٣) جا بەهۆی ئەوەوە کە نەوەی ئیسرائیل بەردەوام پەیمان و بەڵێنەکانیان دەشکاند، نەفرەتمان لێکردن و دڵەکانیانمان ڕەق و سەخت و ڕەش کرد (چونکە یەکێک لە سیفەتیان ئەوەیە)کە: قسە لە جێی خۆیدا ناکەن و جێی دەگۆڕن (بە ئارەزووی خۆیان دەستکاریی تەوراتیشیان کردووە) هەروەها بەشێک لەو شتانەی کە یاداوەری بوو بۆیان فەرامۆشیان کردو، بەردەوام دەبینیت و بۆت دەردەکەوێت کە زۆربەیان خیانەتکارو دوژمنکارن، مەگەر کەمێکیان نەبێت، (لەگەڵ ئەوەشدا قەیناکات) هەر لێیان خۆش ببەو چاوپۆشیان لێ بکە، چونکە بەڕاستی خوا چاکەکارانی خۆشدەوێت.

وَمِنَ ٱلَّذِينَ قَالُوٓاْ إِنَّا نَصَٰرَىٰٓ أَخَذۡنَا مِيثَٰقَهُمۡ فَنَسُواْ حَظّٗا مِّمَّا ذُكِّرُواْ بِهِۦ فَأَغۡرَيۡنَا بَيۡنَهُمُ ٱلۡعَدَاوَةَ وَٱلۡبَغۡضَآءَ إِلَىٰ يَوۡمِ ٱلۡقِيَٰمَةِۚ وَسَوۡفَ يُنَبِّئُهُمُ ٱللَّهُ بِمَا كَانُواْ يَصۡنَعُونَ ﴿١٤﴾ يَٰٓأَهۡلَ ٱلۡكِتَٰبِ قَدۡ جَآءَكُمۡ رَسُولُنَا يُبَيِّنُ لَكُمۡ كَثِيرٗا مِّمَّا كُنتُمۡ تُخۡفُونَ مِنَ ٱلۡكِتَٰبِ وَيَعۡفُواْ عَن كَثِيرٖۚ قَدۡ جَآءَكُم مِّنَ ٱللَّهِ نُورٞ وَكِتَٰبٞ مُّبِينٞ ﴿١٥﴾ يَهۡدِي بِهِ ٱللَّهُ مَنِ ٱتَّبَعَ رِضۡوَٰنَهُۥ سُبُلَ ٱلسَّلَٰمِ وَيُخۡرِجُهُم مِّنَ ٱلظُّلُمَٰتِ إِلَى ٱلنُّورِ بِإِذۡنِهِۦ وَيَهۡدِيهِمۡ إِلَىٰ صِرَٰطٖ مُّسۡتَقِيمٖ ﴿١٦﴾ لَّقَدۡ كَفَرَ ٱلَّذِينَ قَالُوٓاْ إِنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلۡمَسِيحُ ٱبۡنُ مَرۡيَمَۚ قُلۡ فَمَن يَمۡلِكُ مِنَ ٱللَّهِ شَيۡـًٔا إِنۡ أَرَادَ أَن يُهۡلِكَ ٱلۡمَسِيحَ ٱبۡنَ مَرۡيَمَ وَأُمَّهُۥ وَمَن فِي ٱلۡأَرۡضِ جَمِيعٗاۗ وَلِلَّهِ مُلۡكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ وَمَا بَيۡنَهُمَاۚ يَخۡلُقُ مَا يَشَآءُۚ وَٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٞ ﴿١٧﴾

**(١٤) هەروەها پەیمانمان لەوانەش وەرگرتووە کە دەیانوت: ئێمە گاورین کەچی بەشێک لەو شتانەیان فەرامۆشکرد کەپێی یاداوەری کرابوون، (بەتایبەتی دەربارەی پێغەمبەرایەتی محمد ﷺ) ئێمەش هەتا ڕۆژی قیامەت دوژمنایەتی و رق و کینەمان پێوەلکاندن، لە ئایندەشدا خوا هەموو ئەو کارو کردەوانەیان دەخاتەوە بەرچاو و پێیان رادەگەیەنێت.**

**(١٥) ئەی خاوەنانی کتێب: دڵنیابن کە پێغەمبەری ئێمە بۆ ئێوەش هاتووە تا زۆربەی ئەو شتانەی کە لای ئێوە روون و ئاشکرانین و دەیشارنەوە، لە کتێبی (تەورات و ئینجیلدا) بۆتان روون و ئاشکرا بکات، هەروەها لە زۆرێک لەو شتانەی کە شاردوتانەتەوە چاوپۆشی دەکات، چونکە بەڕاستی لەلایەن خواوە رووناکیەکی ئاشکراتان بۆهاتووە (کە محمدی پێغەمبەرمانە ﷺ) هاوڕێ لەگەڵ کتێبێکی روونکەرەوەدا (کە قورئانە).**

**(١٦) (بێگومان) خوا بەو قورئانە پیرۆزە هیدایەت و رێنموویی ئەو کەسانە دەکات کە: شوێن رەزامەندی خوا کەوتوون، بەرەو رێبازەکانی ئاشتی و ئاسودەیی و لە تاریکاییەکان دەریاندەهێنێت و رزگاریان دەکات و دەیانخاتە ناو روناکیەوە بەفەرمانی خۆی و رێنموویان دەکات بۆ سەر رێگەو رێبازی راست و دروستی (دینداری و خواناسیی و چاکە).**

**(١٧) سوێند بێت بێگومان ئەوانە بێ باوەڕ بوون کە وتیان: بەڕاستی خوا، هەر مەسیحی کوڕی مەریەمە، (ئەی محمد ﷺ پێیان) بڵێ: ئەگەر خوا بیەوێت مەسیحی کوڕی مەریەم و دایکی و هەرچی لەسەر زەویدا هەیە لەناوی بەرێت، ئەوە کێیە لە بەرامبەر خواوە دەسەڵاتی شتێکی هەیە؟ (کەواتە ئەویش و دایکیشی و ئەو خەڵکەش بەدیهێنراوی خوان و لە دەسەڵاتی دەرناچن، ئیتر بە چ بەڵگەیەک قسەی وا نابەجێ دەکەن؟!، بەمەرجێک) خوا زاتێکە هەرچی لە ئاسمانەکان و زەوی و نێوانیاندا هەیە هەر ئەو خاوەنیانە، هەرچی بیەوێت دروستی دەکات (شتێکی ئاسابیە ئەو زاتە مەسیح بێ باوک دروست بکات)، چونکە خوا دەسەڵاتی هەیە بەسەر هەموو شتێکدا (هەموو شت لای ئەو ئاسانە).**

وَقَالَتِ ٱلْيَهُودُ وَٱلنَّصَـٰرَىٰ نَحْنُ أَبْنَـٰٓؤُا۟ ٱللَّهِ وَأَحِبَّـٰٓؤُهُۥ ۚ قُلْ فَلِمَ يُعَذِّبُكُم بِذُنُوبِكُم ۖ بَلْ أَنتُم بَشَرٌ مِّمَّنْ خَلَقَ ۚ يَغْفِرُ لِمَن يَشَآءُ وَيُعَذِّبُ مَن يَشَآءُ ۚ وَلِلَّهِ مُلْكُ ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَمَا بَيْنَهُمَا ۖ وَإِلَيْهِ ٱلْمَصِيرُ ﴿١٨﴾ يَـٰٓأَهْلَ ٱلْكِتَـٰبِ قَدْ جَآءَكُمْ رَسُولُنَا يُبَيِّنُ لَكُمْ عَلَىٰ فَتْرَةٍ مِّنَ ٱلرُّسُلِ أَن تَقُولُوا۟ مَا جَآءَنَا مِنۢ بَشِيرٍ وَلَا نَذِيرٍ ۖ فَقَدْ جَآءَكُم بَشِيرٌ وَنَذِيرٌ ۗ وَٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ ﴿١٩﴾ وَإِذْ قَالَ مُوسَىٰ لِقَوْمِهِۦ يَـٰقَوْمِ ٱذْكُرُوا۟ نِعْمَةَ ٱللَّهِ عَلَيْكُمْ إِذْ جَعَلَ فِيكُمْ أَنۢبِيَآءَ وَجَعَلَكُم مُّلُوكًا وَءَاتَىٰكُم مَّا لَمْ يُؤْتِ أَحَدًا مِّنَ ٱلْعَـٰلَمِينَ ﴿٢٠﴾ يَـٰقَوْمِ ٱدْخُلُوا۟ ٱلْأَرْضَ ٱلْمُقَدَّسَةَ ٱلَّتِى كَتَبَ ٱللَّهُ لَكُمْ وَلَا تَرْتَدُّوا۟ عَلَىٰٓ أَدْبَارِكُمْ فَتَنقَلِبُوا۟ خَـٰسِرِينَ ﴿٢١﴾ قَالُوا۟ يَـٰمُوسَىٰٓ إِنَّ فِيهَا قَوْمًا جَبَّارِينَ وَإِنَّا لَن نَّدْخُلَهَا حَتَّىٰ يَخْرُجُوا۟ مِنْهَا فَإِن يَخْرُجُوا۟ مِنْهَا فَإِنَّا دَٰخِلُونَ ﴿٢٢﴾ قَالَ رَجُلَانِ مِنَ ٱلَّذِينَ يَخَافُونَ أَنْعَمَ ٱللَّهُ عَلَيْهِمَا ٱدْخُلُوا۟ عَلَيْهِمُ ٱلْبَابَ فَإِذَا دَخَلْتُمُوهُ فَإِنَّكُمْ غَـٰلِبُونَ ۚ وَعَلَى ٱللَّهِ فَتَوَكَّلُوٓا۟ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ ﴿٢٣﴾

(١٨) جولەکەو گاور دەیانوت: ئێمە رۆڵەی خواو خۆشەویست و نزیکی ئەوین، پێیان بڵێ: کەواتە بۆچی لەسەر گوناهو تاوانتان سزاتان دەدات (لە دنیادا بەئاشکرا بەلاو ناخۆشیتان بۆ پێش دەهێنێت ، سزای قیامەتیش با لەولاوە بوەستێت، ئێوە خۆتان ئاوا بەگەورەو نازدار دامەنێن و خۆتان جیا مەکەنەوە) نەخێر وانیە، چونکە ئێوەش بەشەر و ئادەمیزادێکن لەو خەڵکەی کە دروستی کردووە، ئەوەی خوا بیەوێت لێی خۆش ببێت، لێی خۆش دەبێت، ئەوەش کە بیەوێت سزای بدات سزای دەدات (ئەڵبەتە لە چوارچێوەی دادپەروەریدا) هەرچیش لە ئاسمانەکان و زەوی و نێوانیاندا هەیە هەر خوا خاوەنیانە، گەڕانەوە و سەرئەنجامیش بۆ لای ئەو زاتەیە.

(١٩) ئەی خاوەنانی کتێب: بێگومان پێغەمبەرمان (محمد ﷺ) هاتووە بۆ لاتان تا هەموو شتێکتان بۆ روون بکاتەوە، دوای ئەوەی کە ماوەیەک بوو هیچ پێغەمبەرێکمان رەوانە نەکردبوو (نێوان لە دایک بوونی عیسا و ناردنی محەمەد سەلامی خوایان لەسەر بێت، زیاتر لە شەش سەدەیە) نەوەکو بڵێن کەسمان بۆ رەوانە نەکرا تا مژدەدەر بێت (بەچاکان) و ترسێنەربێت بۆ (یاخیەکان)، ئەوەتە بەراستی مژدەدەرو ترسێنەرتان بۆ هات (ئیتر هیچ بیانوویەکتان نەماوە)، خوایش دەسەڵاتی بەسەر هەموو شتێکدا هەیە (ئەگەر یاخی بن سزاتان دەدات).

(٢٠) یادیان بێنەوە کاتێک موسا بەقەومەکەی وت: ئەی قەوم و عەشرەتم یادی نازو نیعمەتی خوا بکەنەوە لە سەرتان کە پێغەمبەرانی لەناو ئێوەدا فەراهەم هێناوە، هەروەها پاشای زۆری لەناوتاندا هەڵخستووە، ئەوەی بە ئێوەی بەخشیووە بەکەسی تری نەبەخشیووە لەو خەڵکە بێ شومارەی (ئەو سەردەمە).

(٢١) ئەی قەوم و عەشرەتم بچنە ناو ئەو زەویە پیرۆزەی (القدس)، کە خوا پێویستی کرد لەبەر سوودی خۆتان بچنە ناوی، پاشگەز مەبنەوەو پاشەکشێ مەکەن تا خەسارەتمەندو زەرەرمەند نەبن.

(٢٢) (کەچی) وتیان: ئەی موسا بەڕاستی خەڵکێکی ئازاو بەرزو دلێری تێدایە، بێگومان ئێمە هەرگیز ناچینە ناوی تا ئەوانی لێدەرنەچن، جا ئەگەر ئەوان دەرچوون لێی، ئەوە بێگومان ئێمە دەچینە ناوی و لەوێ دەبین!!

(٢٣) (بەلام) دوو کەس لەوانەی کە ترسی خوایان لەدڵدا بوو و خوا نازو نیعمەتی ئیمان و دڵنیایی تەواوی پێ بەخشیبوون وتیان: لە دەروازەی شارەوە بچنە سەریان و (یەک هێرشی گەورە بەرن) هەر کە چوونە ئەو دیوەوە، ئەوە بێگومان ئیتر ئێوە سەرکەوتوون (دوژمنتان شکست دەهێنێت، جا بۆ بەدەستهێنانی ئەو سەرکەوتنە) دەبێت: بە تەواویی پشت بە خوا ببەستن ئەگەر ئێوە ئیماندارن.

قَالُوا يَا مُوسَىٰ إِنَّا لَن نَّدْخُلَهَا أَبَدًا مَّا دَامُوا فِيهَا فَاذْهَبْ أَنتَ وَرَبُّكَ فَقَاتِلَا إِنَّا هَاهُنَا قَاعِدُونَ ﴿٢٤﴾ قَالَ رَبِّ إِنِّي لَا أَمْلِكُ إِلَّا نَفْسِي وَأَخِي فَافْرُقْ بَيْنَنَا وَبَيْنَ الْقَوْمِ الْفَاسِقِينَ ﴿٢٥﴾ قَالَ فَإِنَّهَا مُحَرَّمَةٌ عَلَيْهِمْ أَرْبَعِينَ سَنَةً يَتِيهُونَ فِي الْأَرْضِ فَلَا تَأْسَ عَلَى الْقَوْمِ الْفَاسِقِينَ ﴿٢٦﴾ ۞ وَاتْلُ عَلَيْهِمْ نَبَأَ ابْنَيْ آدَمَ بِالْحَقِّ إِذْ قَرَّبَا قُرْبَانًا فَتُقُبِّلَ مِنْ أَحَدِهِمَا وَلَمْ يُتَقَبَّلْ مِنَ الْآخَرِ قَالَ لَأَقْتُلَنَّكَ قَالَ إِنَّمَا يَتَقَبَّلُ اللَّهُ مِنَ الْمُتَّقِينَ ﴿٢٧﴾ لَئِن بَسَطتَ إِلَيَّ يَدَكَ لِتَقْتُلَنِي مَا أَنَا بِبَاسِطٍ يَدِيَ إِلَيْكَ لِأَقْتُلَكَ إِنِّي أَخَافُ اللَّهَ رَبَّ الْعَالَمِينَ ﴿٢٨﴾ إِنِّي أُرِيدُ أَن تَبُوءَ بِإِثْمِي وَإِثْمِكَ فَتَكُونَ مِنْ أَصْحَابِ النَّارِ وَذَٰلِكَ جَزَاءُ الظَّالِمِينَ ﴿٢٩﴾ فَطَوَّعَتْ لَهُ نَفْسُهُ قَتْلَ أَخِيهِ فَقَتَلَهُ فَأَصْبَحَ مِنَ الْخَاسِرِينَ ﴿٣٠﴾ فَبَعَثَ اللَّهُ غُرَابًا يَبْحَثُ فِي الْأَرْضِ لِيُرِيَهُ كَيْفَ يُوَارِي سَوْءَةَ أَخِيهِ قَالَ يَا وَيْلَتَا أَعَجَزْتُ أَنْ أَكُونَ مِثْلَ هَٰذَا الْغُرَابِ فَأُوَارِيَ سَوْءَةَ أَخِي فَأَصْبَحَ مِنَ النَّادِمِينَ ﴿٣١﴾



(٢٤) کەچی وتیان: ئەی موسا دڵنیابە ئێمە هەرگیز ناچینە ئەو شارەوە و رووی تێناکەین مادەم ئەو جەنگاوەرانەی تێدا بێت، (ئیتر تۆ کەیفی خۆتە حەز دەکەیت) بچۆ خۆت و پەروەردگارت جەنگ بکەن دژیان، ئێمە بەڕاستی ئا لێرە دانیشتووین (چاوەڕێی سەرئەنجامین)!!

(٢٥) ئینجا موسا وتی: پەروەردگارا بەڕاستی من دەسەڵاتم نیە جگە بەسەر خۆم و براکەمدا نەبێت (ئێمە ئامادەی هەموو فەرمانێکی تۆین) ئیتر داواکارین کە ئێمە جیا بکەیتەوە لەو خەڵکە تاوانکار و ستەم پیشەیە...

(٢٦) خوا فەرمووی: بەڕاستی ئەوە ئیتر شاری قدس لەسەریان حەرامە، دەبێت چل ساڵیش وێڵ و سەرگەردان بن لەسەر زەویدا (تا ئەو نەوە ترسنۆکە تیا بچێت و نەوەی تازە پێبگات)، ئیتر خەفەت مەخۆ بۆ گەل و هۆزی تاوانبار و ستەم پیشە.

(٢٧) بەسەرهات و هەواڵی دوو کوڕەکەی ئادەم بۆ ئەو خەڵکە بخوێنەرەوە کە: بەڕاستی روویداوە، ئەوە بوو کاتێک هەردووکیان قوربانییان کرد، لە یەکێکیان وەرگیرا (کە لەسەر حق بوو، لە خوا ترس بوو) و لەوی تریان وەرنەگیرا (چونکە رق ئەستوورو حەسوودو خوانەناس بوو) بەبراکەی وت: هەر دەتکوژم ئەویش لە وەڵامی هەڕەشەکەیدا وتی: خوای گەورە تەنها لە پارێزکاران قوربانی و چاکە وەردەگرێت.

(٢٨) سوێند بە خوا ئەگەر تۆ دەست درێژ بکەیت بۆ من بۆ ئەوەی بمکوژیت، من دەستدرێژ ناکەم بۆ تۆ بۆ ئەوەی بتکوژم، چونکە بەڕاستی من لەسزاو تۆڵەی خوا، پەروەردگاری جیهانەکان دەترسم.

(٢٩) (من بەو دەست درێژ نەکردنەم) بەڕاستی دەمەوێت بەگوناهی من و گوناهی خۆیشتەوە بگەڕێیتەوە، ئەوجا دەبیتە نیشتەجێی ناو ئاگر، هەر ئەوەشە پاداشتی ستەمکاران.

(٣٠) سەرئەنجام نەفسی سەرکەشی هانیداو کوشتنی براکەی لاسادە و ئاسان کردو کوشتی، ئیتر خۆی خستە ریزی خەسارەتمەند و زەرەرمەندانەوە.

(٣١) (لەوەودوا گیری خوارد بەدەست تەرمەکەیەوە، چونکە وادیارە یەکەم کەسە کوژرا بێت و شەهید بوو بێت)، ئەوسا خوای میهرەبان قەلەڕەشێکی ناردو چاڵێکی لە زەویدا هەڵکەند (بۆ قەلەڕەشێکی تری مردارەوە بوو) تا نیشانی بدات چۆن لاشەی براکەی بشارێتەوە، (هەرکە ئەوەی دی) وتی: هاوار لە من، ئایا ئەوە من نەمتوانی وەکو ئەو قەلەڕەشە بکەم و بەقەدەر ئەوم لێنەهات تا لاشە و عەیب و عاری براکەم بشارمەوە، ئیتر بۆ هەمیشە چووە ریزی پەشیمانانەوە.

مِنْ أَجْلِ ذَٰلِكَ كَتَبْنَا عَلَىٰ بَنِي إِسْرَائِيلَ أَنَّهُ مَن قَتَلَ نَفْسًا بِغَيْرِ نَفْسٍ أَوْ فَسَادٍ فِي الْأَرْضِ فَكَأَنَّمَا قَتَلَ النَّاسَ جَمِيعًا وَمَنْ أَحْيَاهَا فَكَأَنَّمَا أَحْيَا النَّاسَ جَمِيعًا ۚ وَلَقَدْ جَاءَتْهُمْ رُسُلُنَا بِالْبَيِّنَاتِ ثُمَّ إِنَّ كَثِيرًا مِّنْهُم بَعْدَ ذَٰلِكَ فِي الْأَرْضِ لَمُسْرِفُونَ ﴿٣٢﴾ إِنَّمَا جَزَاءُ الَّذِينَ يُحَارِبُونَ اللَّهَ وَرَسُولَهُ وَيَسْعَوْنَ فِي الْأَرْضِ فَسَادًا أَن يُقَتَّلُوا أَوْ يُصَلَّبُوا أَوْ تُقَطَّعَ أَيْدِيهِمْ وَأَرْجُلُهُم مِّنْ خِلَافٍ أَوْ يُنفَوْا مِنَ الْأَرْضِ ۚ ذَٰلِكَ لَهُمْ خِزْيٌ فِي الدُّنْيَا ۖ وَلَهُمْ فِي الْآخِرَةِ عَذَابٌ عَظِيمٌ ﴿٣٣﴾ إِلَّا الَّذِينَ تَابُوا مِن قَبْلِ أَن تَقْدِرُوا عَلَيْهِمْ ۖ فَاعْلَمُوا أَنَّ اللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿٣٤﴾ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اتَّقُوا اللَّهَ وَابْتَغُوا إِلَيْهِ الْوَسِيلَةَ وَجَاهِدُوا فِي سَبِيلِهِ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ ﴿٣٥﴾ إِنَّ الَّذِينَ كَفَرُوا لَوْ أَنَّ لَهُم مَّا فِي الْأَرْضِ جَمِيعًا وَمِثْلَهُ مَعَهُ لِيَفْتَدُوا بِهِ مِنْ عَذَابِ يَوْمِ الْقِيَامَةِ مَا تُقُبِّلَ مِنْهُمْ ۖ وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿٣٦﴾

(٣٢) لەبەر ئەوەی كارەساتی كوشتنی نارەوای ئاوا روو نەدات ئێمە پێویستمان كرد لەسەر نەوەی ئیسرائیل ئەوەی كەسێك بەناحەق بكوژێت و لە جیاتی كوژراوێك نەبێت، یان گوناهو تاوانی گەورەی ئەنجام نەدابێت لەزەویدا (وەكو جەردەیی و دەستدرێژی و...هتد)، ئەوە وەك ئەوە وایە هەر هەموو خەڵكی كوشتبێت، ئەوەش كەسێك لە مەرگ رزگار بكات، هەروەك ئەوە وایە هەموو خەڵكی لەمەرگ رزگار كردبێت و ژیانی پێ بەخشی بن، سوێند بێت بەخوا بەراستی پێغەمبەرانمان بە بەڵگەو موعجیزەی ئاشكراو دیارەوە هاتووە بۆ لایان(تا پابەندی حەق و داد بن) كەچی زۆربەیان دوای ئەو رێنموویيانە، هەر زیادەڕە و بوون لەم سەر زەمینەدا لە ستەم و كوشتنی ناحەقدا.

(٣٣) بێگومان پاداشتی ئەوانەی كە دەجەنگێن و دوژمنایەتی خواو پێغەمبەرەكەی دەكەن و بە گەرمی هەوڵ دەدەن بۆ بڵاو كردنەوەی فەسادو بەد ڕەوشتی لە زەویدا هەر ئەوەیە: (ئەوانەیان كە خەڵكیان كوشتووە) دەبێت بكوژرێن، (ئەوانەش كەخەڵكیان كوشتووە و جەردەییشیان كردووە) دەبێت لە خاچ بدرێن، (ئەوانەیان تەنها جەردەیی دەكەن) دەست و قاچێكیان بەپێچەوانەوە ببڕدرێت، (ئەوانەیان كە مەترسیان لێدەكرێت) ئەوە دوور بخرێنەوە لە وڵات، ئەوسزایە خەجاڵەتی و سەرشۆڕیە بۆیان لەدنیادا، لەقیامەتیشدا سزای سەخت وگەورەیان بۆهەیە.

(٣٤) جگە لەوانەیان كە تەوبەیان كردووە، پێش ئەوەی دەستی ئێوەیان بگاتێ، ئەوە بزانن كە بەڕاستی خوا لێخۆشبوو و میهرەبانە (ئەڵبەتە ئەگەر مافی خەڵكیان بەسەرەوە نەبێت).

(٣٥) ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە لە خوا بترسن و پارێزكار بن، لە رێگەی هەموو هۆكارو كردەوەیەكی چاكەوە هەوڵ بدەن ڕەزامەندیی ئەو زاتە بەدەست بهێنن، هەمیشە هەوڵ و كۆشش و جیهادو خەبات بكەن لە پێناوی رێباز و بەرنامەی ئەو زاتەدا، بۆ ئەوەی سەرفراز بن (لە هەردوو جیهاندا).

(٣٦) بێگومان ئەوانەی بێ باوەڕ بوون، ئەگەر هەرچی سامانی زەوی هەیە هەیان بێت و ئەوەندەی تریشی لەگەڵ بێت و بیانەوێت خۆیانی پێ رزگار بكەن لە سزای رۆژی قیامەت، لێیان وەرناگیرێت، ئەوانە سزایەكی بە ئێشیان بۆ ئامادە كراوە (دەبێت تیایدا گیر بخۆن).

يُرِيدُونَ أَن يَخْرُجُوا مِنَ النَّارِ وَمَا هُم بِخَارِجِينَ مِنْهَا وَلَهُمْ عَذَابٌ مُّقِيمٌ ﴿٣٧﴾ وَالسَّارِقُ وَالسَّارِقَةُ فَاقْطَعُوا أَيْدِيَهُمَا جَزَاءً بِمَا كَسَبَا نَكَالًا مِّنَ اللَّهِ وَاللَّهُ عَزِيزٌ حَكِيمٌ ﴿٣٨﴾ فَمَن تَابَ مِن بَعْدِ ظُلْمِهِ وَأَصْلَحَ فَإِنَّ اللَّهَ يَتُوبُ عَلَيْهِ إِنَّ اللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿٣٩﴾ أَلَمْ تَعْلَمْ أَنَّ اللَّهَ لَهُ مُلْكُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ يُعَذِّبُ مَن يَشَاءُ وَيَغْفِرُ لِمَن يَشَاءُ وَاللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ ﴿٤٠﴾ ۞ يَا أَيُّهَا الرَّسُولُ لَا يَحْزُنكَ الَّذِينَ يُسَارِعُونَ فِي الْكُفْرِ مِنَ الَّذِينَ قَالُوا آمَنَّا بِأَفْوَاهِهِمْ وَلَمْ تُؤْمِن قُلُوبُهُمْ وَمِنَ الَّذِينَ هَادُوا سَمَّاعُونَ لِلْكَذِبِ سَمَّاعُونَ لِقَوْمٍ آخَرِينَ لَمْ يَأْتُوكَ يُحَرِّفُونَ الْكَلِمَ مِن بَعْدِ مَوَاضِعِهِ يَقُولُونَ إِنْ أُوتِيتُمْ هَٰذَا فَخُذُوهُ وَإِن لَّمْ تُؤْتَوْهُ فَاحْذَرُوا وَمَن يُرِدِ اللَّهُ فِتْنَتَهُ فَلَن تَمْلِكَ لَهُ مِنَ اللَّهِ شَيْئًا أُولَٰئِكَ الَّذِينَ لَمْ يُرِدِ اللَّهُ أَن يُطَهِّرَ قُلُوبَهُمْ لَهُمْ فِي الدُّنْيَا خِزْيٌ وَلَهُمْ فِي الْآخِرَةِ عَذَابٌ عَظِيمٌ ﴿٤١﴾



(٣٧) ئەوانە دەیانەوێت لە دۆزەخ دەرچن (بەڵام خەیاڵیان خاوە) لەکاتێکدا دەرچوونیان لێی نییە، ئەوانە سزایەکی بەردەوامیان بۆ ئامادەیە.

(٣٨) دەستی پیاوی دزو ئافرەتی دز ببڕن لە پاداشتی کاری ناڕەوایاندا ئەمەش تۆڵەیەکە لە لایەن خواوە، خوا باڵادەست و دانایە (لە بڕیاردانی ئەو سزایەدا، ئەڵبەتە ئەم سزایە لە کۆمەڵگەی ئیسلامیدا جێبەجێ دەکرێت، کە: هەموو کەسێک ژیانی مسۆگەرە و هەمووان دەستی یارمەتی بۆ یەکتر درێژ دەکەن، هەروەها لە ساڵانی گرانیدا دەست نابڕدرێت).

(٣٩) جا ئەوەی دوای ستەم و تاوانەکەی تەوبە بکات و چاکسازی لە خۆیدا بکات (دڵ و دەروونی خاوێن بکاتەوە، ماڵی خەڵکی بداتەوە و چاوی لە دزێتی نەمێنێت)، ئەوە بێگومان خوا تەوبەکەی لێوەردەگرێت، چونکە بەڕاستی خوای گەورە لێخۆشبوو میهرەبانە.

(٤٠) (ئەی محمد ﷺ، ئەی ئیماندار) ئایا نەتزانیووە هەرچی لە ئاسمانەکان و زەویدا هەیە، بەڕاستی تەنها هەر خوا خاوەنیانە، سزای هەر کەسێک کە بیەوێت دەیدات (ئەڵبەتە هەڕەمەکی نیە، بەڵکو لە رووی دادپەروەری تەواوەوە)، هەروەها خۆش دەبێت لەو کەسەی کە دەیەوێت و مەبەستێتی لێی خۆش ببێت، ئەو خوایە دەسەڵاتی بەسەر هەموو شتێکدا هەیە (شوێنی پاداشت و سزای جێگەی هەموانی تێدا دەبێتەوە).

(٤١) ئەی پێغەمبەر ﷺ با غەمبارت نەکات ئەوانەی کە بەپەلە بەدەم بێ باوەڕی و بێ دینیەوە دەچن، لەوانەی کە بەدەم و زار دەڵێن: باوەڕمان هێناوە، بەڵام دڵیان باوەڕی نەهێناوە، هەروەها لەوانەش کە بوونەتە جولەکە و زۆر گوێگرن بۆ درۆو دەلەسە، زۆر گوێبیستن بۆ خەڵکی تریش (کە خوانەناسن و) نەهاتوون بۆ لات، قسە دەگۆڕن و قسە وەکو خۆی ناگێڕنەوە، یاخود ئاوەژووی دەکەن، دوای ئەوەی جێی خۆی گرتبوو (ئەوانەی کە خەڵک دەنێرن بۆ لای پێغەمبەرو پێی) دەڵێن: ئەگەر ئاوا بڕیاریدا لێی وەربگرن، ئەگەر وانەبوو هوشیار بن، جا ئەوەی خوای گەورە بیەوێت تووشی تاقیکردنەوە و سزای بکات، ئەوە هەرگیز تۆ خاوەنی هیچ شتێک نابیت لەلایەن خواوە بۆ رزگار بوونی ئەو، ئائەوانە ئەو کەسانەن خوا نەیویستووە دڵیان پاک و خاوێن بکاتەوە (چونکە خۆیشیان مەبەستیان نەبووە) ئەوانە لە دنیادا سەرشۆڕیی و شەرمەزاریی بەشیانە، لە قیامەتیشدا سزای سەخت و گەورە چاوەڕێیانە.

سَمَّٰعُونَ لِلْكَذِبِ أَكَّٰلُونَ لِلسُّحْتِ ۚ فَإِن جَآءُوكَ فَٱحْكُم بَيْنَهُمْ أَوْ أَعْرِضْ عَنْهُمْ ۖ وَإِن تُعْرِضْ عَنْهُمْ فَلَن يَضُرُّوكَ شَيْـًٔا ۖ وَإِنْ حَكَمْتَ فَٱحْكُم بَيْنَهُم بِٱلْقِسْطِ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلْمُقْسِطِينَ ﴿٤٢﴾ وَكَيْفَ يُحَكِّمُونَكَ وَعِندَهُمُ ٱلتَّوْرَىٰةُ فِيهَا حُكْمُ ٱللَّهِ ثُمَّ يَتَوَلَّوْنَ مِنۢ بَعْدِ ذَٰلِكَ ۚ وَمَآ أُو۟لَٰٓئِكَ بِٱلْمُؤْمِنِينَ ﴿٤٣﴾ إِنَّآ أَنزَلْنَا ٱلتَّوْرَىٰةَ فِيهَا هُدًى وَنُورٌ ۚ يَحْكُمُ بِهَا ٱلنَّبِيُّونَ ٱلَّذِينَ أَسْلَمُوا۟ لِلَّذِينَ هَادُوا۟ وَٱلرَّبَّٰنِيُّونَ وَٱلْأَحْبَارُ بِمَا ٱسْتُحْفِظُوا۟ مِن كِتَٰبِ ٱللَّهِ وَكَانُوا۟ عَلَيْهِ شُهَدَآءَ ۚ فَلَا تَخْشَوُا۟ ٱلنَّاسَ وَٱخْشَوْنِ وَلَا تَشْتَرُوا۟ بِـَٔايَٰتِى ثَمَنًا قَلِيلًا ۚ وَمَن لَّمْ يَحْكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْكَٰفِرُونَ ﴿٤٤﴾ وَكَتَبْنَا عَلَيْهِمْ فِيهَآ أَنَّ ٱلنَّفْسَ بِٱلنَّفْسِ وَٱلْعَيْنَ بِٱلْعَيْنِ وَٱلْأَنفَ بِٱلْأَنفِ وَٱلْأُذُنَ بِٱلْأُذُنِ وَٱلسِّنَّ بِٱلسِّنِّ وَٱلْجُرُوحَ قِصَاصٌ ۚ فَمَن تَصَدَّقَ بِهِۦ فَهُوَ كَفَّارَةٌ لَّهُۥ ۚ وَمَن لَّمْ يَحْكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلظَّٰلِمُونَ ﴿٤٥﴾

(٤٢) ئەو (جولەکانە) زۆر بە دڵ گەرمی گوێ بۆ درۆ دەگرن و کەسایەتیان ناپوختەو زۆر حەرام خۆر و سوو خۆرن، جا ئەگەر کێشەیەکیان هەبوو ، هاتن بۆ لات (تۆ سەربەستی) داوەری بکەیت لە نێوانیاندا یان گوێیان پێنەدەیت، خۆ ئەگەر گوێیان نەدەیتێ، ئەوە هەرگیز ناتوانن هیچ جۆرە زیانێکت پێبگەیەنن، خۆ ئەگەر دادوەریت کرد لە نێوانیاندا دادپەروەرانە ئەنجامی بدە، چونکە بەڕاستی خوا دادپەروەرو ماف پەروەرانی خۆش دەوێت.

(٤٣) (سەیرە)! ئەوانە چۆن دێن و تۆ دەکەن بە دادوەر، لەکاتێکدا خۆیان تەوراتیان لایەو فەرمانی خوای بەروونی تیادایە، پاشان پشتی تێدەکەن دوای ئەوەی کە(حوکم و فەرمانی خوایان بۆ دەردەکەوێت) دیارە ئەوانە هەر ئیماندار نین (لە مەدینەدا یەکێک لە ناودارانی جوو زینای کردبوو، حوکمی زیناکەرێک هاوسەری هەبێت لە تەوراتدا بەرد باران کردنە، هاتن بۆ خزمەتی پێغەمبەر ﷺ، تا بەڵکو حوکمەکەی لەقورئاندا ئاسانتر بێت، بەمەرجێک باوەڕیان بە پێغەمبەرو بە قورئان نەبوو، کاتێک پێغەمبەر گێڕاینەوە بۆ لای حوکمی تەورات پشتیان هەڵکرد و بەدڵیان نەبوو...).

(٤٤) بەڕاستی ئێمە کاتێک تەوراتمان ناردە خوارەوە ڕێنموویی تیادا بوو (بۆ هەموو خێرو چاکەیەک)، نوور و رووناکیش بوو (لەناو تاریکاییەکاندا)، ئەو پێغەمبەرانەی کە هەمیشە ملکەچ و فەرمانبەردار بوون حوکمی ئەوانەیان پێدەکرد کە ببوونە جولەکە، هەروەها زانا پەروەردگار ناسەکانیان و زانا شەرع ناسەکانیشیان، حوکمیان دەکرد بەوەی داوایان لێکرابوو بیپارێزن، کە ئەویش کتێبی خوا (تەوراتە)، هەروەها شایەتیش بوون لەسەری (کەواتە ئەی زانایانی جولەکە، ئەی ئیمانداران) لە خەڵکی مەترسن بەڵکو تەنها لە من بترسن، ئایەت و فەرمانەکانی من بەنرخێکی کەم مەفرۆشن (ئەگەر نرخەکە هەموو دنیاش بێت هەر کەمە) جا ئەوەی حوکم و داوەری بەو بەرنامەیە نەکات کە خوا دایبەزاندووە، ئائەوانە بێ باوەڕن.

(٤٥) لە تەوراتدا پێویستمان کردووە لەسەریان کە بەڕاستی هەر کەسێک کەسێک بکوژێت دەبێت بکوژرێتەوە و چاوی یەکێک کوێر بکات، دەبێت چاوی کوێر بکرێتەوە و لووتی یەکێک عەیبدار بکات دەبێت لووتی عەیبدار بکرێتەوە و گوێی یەکێک ببڕێت دەبێت گوێی ببردرێتەوە و ددانی یەکێک بشکێنێت دەبێت ددانی بشکێنرێتەوەو برین و زامەکانیش هەروەها تۆڵەیان بەگوێرەی خۆی بۆ دەسەنرێتەوە، جائەوەی لە تاوانبار خۆش ببێت، ئەو چاوپۆشی و لێخۆشبوونە دەبێتە کەفارەتی گوناهانی، بێگومان ئەوەی حوکم و داوەری نەکات بەو بەرنامەیەی کە خوا دایبەزاندوە، ئائەوانە هەر ستەمکارن.

وَقَفَّيْنَا عَلَىٰٓ ءَاثَٰرِهِم بِعِيسَى ٱبْنِ مَرْيَمَ مُصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ يَدَيْهِ مِنَ ٱلتَّوْرَىٰةِ ۖ وَءَاتَيْنَٰهُ ٱلْإِنجِيلَ فِيهِ هُدًى وَنُورٌ وَمُصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ يَدَيْهِ مِنَ ٱلتَّوْرَىٰةِ وَهُدًى وَمَوْعِظَةً لِّلْمُتَّقِينَ ﴿٤٦﴾ وَلْيَحْكُمْ أَهْلُ ٱلْإِنجِيلِ بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فِيهِ ۚ وَمَن لَّمْ يَحْكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْفَٰسِقُونَ ﴿٤٧﴾ وَأَنزَلْنَآ إِلَيْكَ ٱلْكِتَٰبَ بِٱلْحَقِّ مُصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ يَدَيْهِ مِنَ ٱلْكِتَٰبِ وَمُهَيْمِنًا عَلَيْهِ ۖ فَٱحْكُم بَيْنَهُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ ۖ وَلَا تَتَّبِعْ أَهْوَآءَهُمْ عَمَّا جَآءَكَ مِنَ ٱلْحَقِّ ۚ لِكُلٍّ جَعَلْنَا مِنكُمْ شِرْعَةً وَمِنْهَاجًا ۚ وَلَوْ شَآءَ ٱللَّهُ لَجَعَلَكُمْ أُمَّةً وَٰحِدَةً وَلَٰكِن لِّيَبْلُوَكُمْ فِى مَآ ءَاتَىٰكُمْ ۖ فَٱسْتَبِقُوا۟ ٱلْخَيْرَٰتِ ۚ إِلَى ٱللَّهِ مَرْجِعُكُمْ جَمِيعًا فَيُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمْ فِيهِ تَخْتَلِفُونَ ﴿٤٨﴾ وَأَنِ ٱحْكُم بَيْنَهُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ وَلَا تَتَّبِعْ أَهْوَآءَهُمْ وَٱحْذَرْهُمْ أَن يَفْتِنُوكَ عَنۢ بَعْضِ مَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ إِلَيْكَ ۖ فَإِن تَوَلَّوْا۟ فَٱعْلَمْ أَنَّمَا يُرِيدُ ٱللَّهُ أَن يُصِيبَهُم بِبَعْضِ ذُنُوبِهِمْ ۗ وَإِنَّ كَثِيرًا مِّنَ ٱلنَّاسِ لَفَٰسِقُونَ ﴿٤٩﴾ أَفَحُكْمَ ٱلْجَٰهِلِيَّةِ يَبْغُونَ ۚ وَمَنْ أَحْسَنُ مِنَ ٱللَّهِ حُكْمًا لِّقَوْمٍ يُوقِنُونَ ﴿٥٠﴾

(٤٦) ئینجا بەشوێن ئاسەواری هەموو پێغەمبەرانی (نەوەی ئیسرائیلدا) عیسای کوڕی مەریەممان هێنا، کە ڕاستی تەوراتی دەردەخست و پشتیوانی لێدەکردو ئینجیلیشمان پێدا، کە هیدایەت و نوور و ڕووناکی تێدایە و پشتگیریی تەوراتی پێش خۆیەتی، هیدایەت و ڕێنموویی و ئامۆژگاریە بۆ ئەو کەسانەی کە لە خوا دەترسن و پارێزکارن.

(٤٧) دەبا شوێنکەوتووانی ئینجیل بەو ڕێنموویی و ئامۆژگاریانە هەڵسوکەوت بکەن کە خوا لە ئینجیلدا دایبەزاندوە (گرنگترینیان شوێنکەوتنی ئاینی ئیسلام و پێغەمبەری ئیسلامە) ئەوەی حوکم و داوەری نەکات بەو بەرنامەیەی کە خوا دایبەزاندوە، جا ئا ئەوانە ناپاک و تاوانبارو لە سنوور دەرچوون.

(٤٨) ئێمە قورئانمان هاوڕێ لەگەڵ هەموو حەقیقەت و ڕاستیەکدا بۆ تۆ دابەزاندووە، ڕاستی و دروستی کتێبەکانی پێش خۆیشی دیاری دەکات و چاودێرە بەسەر هەموویاندا (کاتێک خاوەنانی کتێب لە گاورو جوو گیروگرفتیان دەهێنن بۆ لای تۆ) بەو بەرنامەیەی خوا ناردوویەتی داوەریی بکە لە نێوانیانداو شوێن ئارەزووەکانی ئەوان مەکەوەو لەو حەقە لامەدە کە بۆت ڕەوانە کراوە، بۆ هەرلایەکتان (موسڵمانان و خاوەنانی کتێب) بەرنامە و پرۆگرامی تایبەتمان بڕیارداوە خۆ ئەگەر خوا بیویستایە هەر هەمووتانی دەکردە یەک ئوممەت و گەلێکی یەک پارچە، بەڵام (ویستی وایە بەو جیاوازیە) تاقیتان بکاتەوە لەوەی پێی بەخشیوون (تا بەهۆی عەقڵ و ژیریتانەوە شوێنی پێغەمبەری ئیسلام بکەون)، دەی کەواتە زۆر بەپەلەبن و پێشبڕکێ بکەن بۆ هەموو خێرو چاکەیەک، دڵنیاش بن کە هەمووتان دەگەڕێنەوە بۆ لای خوا، ئەو کاتە هەواڵی ئەواوتان دەداتێ دەربارەی ئەو شتانەی کەکێشەتان لەسەری هەبوو.

(٤٩) (کاتێک هەندێک لە زاناکانی جوو، هاتن بۆ لات تا داوەریی بکەی لە نێوانیاندا)، داوەری بکە بەو بەرنامەیە (قورئانە)ی کە لەلایەن خواوە بۆت دابەزیووە، شوێنی ئارەزووەکانی ئەوان مەکەوە، وریابە نەوەکو ئەوان ڕێت لێ هەڵە بکەن لە هەندێک لەو ڕێنمووییانەی کە خوا بۆی ناردوویت (جا ئەگەر ئەو جولەکانە ڕازیی نەبوون) و پشتیان هەڵکرد، ئەوە بزانە بەڕاستی خوا دەیەوێت گیرۆدەی سەرئەنجامی هەندێک لە گوناهەکانی خۆیان بکات، بێگومان زۆربەی خەڵکی یاخی و سەرکەش و تاوانبارن.

(٥٠) ئایا ئەوانە حوکم و فەرمانڕەوایی جاهیلیەت و نەفامیان دەوێت و ئەویان لاپەسەندە؟! (ئاخر بۆ بیرناکەنەوە) کێ هەیە بەقەدەر خوا حوکمی جوان و چاک و بەجێ بێت، (بەتایبەت) لای ئەو کەسانەی کە بەوردیی سەرنج دەدەن و ویژدان و هەستی زیندوویان هەیە.



﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَا تَتَّخِذُوا۟ ٱلْيَهُودَ وَٱلنَّصَـٰرَىٰٓ أَوْلِيَآءَ ۘ بَعْضُهُمْ أَوْلِيَآءُ بَعْضٍۢ ۚ وَمَن يَتَوَلَّهُم مِّنكُمْ فَإِنَّهُۥ مِنْهُمْ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَهْدِى ٱلْقَوْمَ ٱلظَّـٰلِمِينَ ﴿٥١﴾ فَتَرَى ٱلَّذِينَ فِى قُلُوبِهِم مَّرَضٌۭ يُسَـٰرِعُونَ فِيهِمْ يَقُولُونَ نَخْشَىٰٓ أَن تُصِيبَنَا دَآئِرَةٌۭ ۚ فَعَسَى ٱللَّهُ أَن يَأْتِىَ بِٱلْفَتْحِ أَوْ أَمْرٍۢ مِّنْ عِندِهِۦ فَيُصْبِحُوا۟ عَلَىٰ مَآ أَسَرُّوا۟ فِىٓ أَنفُسِهِمْ نَـٰدِمِينَ ﴿٥٢﴾ وَيَقُولُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ أَهَـٰٓؤُلَآءِ ٱلَّذِينَ أَقْسَمُوا۟ بِٱللَّهِ جَهْدَ أَيْمَـٰنِهِمْ ۙ إِنَّهُمْ لَمَعَكُمْ ۚ حَبِطَتْ أَعْمَـٰلُهُمْ فَأَصْبَحُوا۟ خَـٰسِرِينَ ﴿٥٣﴾ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ مَن يَرْتَدَّ مِنكُمْ عَن دِينِهِۦ فَسَوْفَ يَأْتِى ٱللَّهُ بِقَوْمٍۢ يُحِبُّهُمْ وَيُحِبُّونَهُۥٓ أَذِلَّةٍ عَلَى ٱلْمُؤْمِنِينَ أَعِزَّةٍ عَلَى ٱلْكَـٰفِرِينَ يُجَـٰهِدُونَ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ وَلَا يَخَافُونَ لَوْمَةَ لَآئِمٍۢ ۚ ذَٰلِكَ فَضْلُ ٱللَّهِ يُؤْتِيهِ مَن يَشَآءُ ۚ وَٱللَّهُ وَٰسِعٌ عَلِيمٌ ﴿٥٤﴾ إِنَّمَا وَلِيُّكُمُ ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱلَّذِينَ يُقِيمُونَ ٱلصَّلَوٰةَ وَيُؤْتُونَ ٱلزَّكَوٰةَ وَهُمْ رَٰكِعُونَ ﴿٥٥﴾ وَمَن يَتَوَلَّ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ فَإِنَّ حِزْبَ ٱللَّهِ هُمُ ٱلْغَـٰلِبُونَ ﴿٥٦﴾ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَا تَتَّخِذُوا۟ ٱلَّذِينَ ٱتَّخَذُوا۟ دِينَكُمْ هُزُوًۭا وَلَعِبًۭا مِّنَ ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْكِتَـٰبَ مِن قَبْلِكُمْ وَٱلْكُفَّارَ أَوْلِيَآءَ ۚ وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ ﴿٥٧﴾

(٥١) ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە جولەکەو گاور مەکەنە یارو یاوەرو پشتیوانی خۆتان ئەوانە هەندێکیان پشتیوان و پشتگیری یەکترن، ئەو کەسەی پشت بەوان ببەستێت، ئەوە هەر لەوانە و (حسابی ئەوانی بۆ دەکرێت) بەڕاستی خوا هیدایەتی قەومی ستەمکار نادات...

(٥٢) بە روونی دەبینی ئەوانەی دڵیان نەخۆشە و (ئیمان لاوازن) بەپەلە دەچن بۆ لایان (بە زمانی حاڵ) دەڵێن : دەترسین بەڵایەکمان تووش بێت یان کارەساتێکمان بەسەر بێت، جا دوور نیە و لەوانەیە بەم نزیکانە خوا سەرکەوتن ببەخشێت(بە ئیمانداران) یاخود بەشێوەیەکی یەکسەریی بە موعجیزەیەکێ لەلایەن خۆیەوە (سەرکەوتنیان پێ ببەخشێت) ئەوکاتە باوەڕ لاوازان پەشیمان دەبنەوە لەسەر ئەو نهێنی و خەتەرە و خەیاڵەی لە دڵ و دەروونیاندا شاردبوویانەوە.

(٥٣) ئەوسا ئەوانەی ئیمانیان هێناوە (لەناو خۆیاندا بەسەرسامیەوە) دەڵێن: ئایا ئەو دووڕووانە ئەوانەن کە سوێندیان بە خوا دەخوارد و جەختیان لەسەر دەکرد کە گوایە بەڕاستی لەگەڵتاندایین؟! کەچی کارەکانیان پووچەڵ بووەوە خەسارەتمەند و زەرەرمەند و مایە پووچ بوون.

(٥٤) ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە، هەر کەس لە ئێوە لە ئاین و بەرنامەکەی وەرگەڕێت و پاشگەز ببێتەوە، ئەوە (هەر خۆی زەرەر دەکات) ئەوە لە ئایندەدا خوا کەسانێک دەهێنێتە کایەوە (ئەوەندە رێکێ و پێکێ و باوەڕ دامەزراون) پەروەردگاری مەزن خۆشی دەوێن، ئەوانیش ئەویان خۆش دەوێت، هەروەها ملکەچ و فەرمانبەردارو بەسۆزن بۆ ئیمانداران و سەربڵندو شکست نەخۆرو دەروون بەرزن بەسەر بێ باوەڕاندا، لە پێناو رێبازی خواداو بۆ بەدەستهێنانی رەزامەندی ئەو هەوڵ دەدەن و خەبات دەکەن و تێدەکۆشن، لە لۆمەی لۆمەکەرانیش ناترسن (ئەم خۆشەویستی و هەڵبژاردن و سۆز و تێکۆشانە) فەزڵ و رێزی تایبەتی خوایە کە دەیبەخشێت بە هەر کەس کە بیەوێت و(شایستە بێت)و خوا فراوانگیرو زانایە (بەنهێنی و ئاشکرا، بەشایستەیی و ناشایستەیی هەر کەس و هەر لایەنێک).

(٥٥) بەڕاستی تەنها خۆشەویست و پشتیوانی ئێوە، هەر خواو پێغەمبەرەکەی و ئەوانەن باوەڕیان هێناوە، کە نوێژەکانیان بەچاکی ئەنجام دەدەن و زەکات لە ماڵ و سامانیان دەردەکەن و هەمیشە دیاردەی کڕنوش و ملکەچییان بۆ پەروەردگار پێوە دیارە.

(٥٦) جا ئەوەی خواو پێغەمبەرو ئەوانەی بڕوایان هێناوە بەپشتیوان و خۆشەویستی خۆی قەبوڵ بکات، ئەوە با دڵنیا بێت کە هەر کۆمەڵ و دەستەو تاقمی خوا، زاڵ و سەرکەوتوون.

(٥٧) ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە: نەکەن ئەوانە بکەنە پشتیوان و جێگەی متمانەی خۆتان کە گاڵتەو گەمەیان بە ئاینەکەتان کردووە، چ لە خاوەنانی کتێبی پێش خۆتان، چ لە بێباوەڕان، لە خواش بترسن و پارێزکاربن ئەگەر ئێوە باوەڕدارن.

وَإِذَا نَادَيْتُمْ إِلَى ٱلصَّلَوٰةِ ٱتَّخَذُوهَا هُزُوًا وَلَعِبًا ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ قَوْمٌ لَّا يَعْقِلُونَ ﴿٥٨﴾ قُلْ يَٰٓأَهْلَ ٱلْكِتَٰبِ هَلْ تَنقِمُونَ مِنَّآ إِلَّآ أَنْ ءَامَنَّا بِٱللَّهِ وَمَآ أُنزِلَ إِلَيْنَا وَمَآ أُنزِلَ مِن قَبْلُ وَأَنَّ أَكْثَرَكُمْ فَٰسِقُونَ ﴿٥٩﴾ قُلْ هَلْ أُنَبِّئُكُم بِشَرٍّ مِّن ذَٰلِكَ مَثُوبَةً عِندَ ٱللَّهِ مَن لَّعَنَهُ ٱللَّهُ وَغَضِبَ عَلَيْهِ وَجَعَلَ مِنْهُمُ ٱلْقِرَدَةَ وَٱلْخَنَازِيرَ وَعَبَدَ ٱلطَّٰغُوتَ أُوْلَٰٓئِكَ شَرٌّ مَّكَانًا وَأَضَلُّ عَن سَوَآءِ ٱلسَّبِيلِ ﴿٦٠﴾ وَإِذَا جَآءُوكُمْ قَالُوٓاْ ءَامَنَّا وَقَد دَّخَلُواْ بِٱلْكُفْرِ وَهُمْ قَدْ خَرَجُواْ بِهِۦ وَٱللَّهُ أَعْلَمُ بِمَا كَانُواْ يَكْتُمُونَ ﴿٦١﴾ وَتَرَىٰ كَثِيرًا مِّنْهُمْ يُسَٰرِعُونَ فِى ٱلْإِثْمِ وَٱلْعُدْوَٰنِ وَأَكْلِهِمُ ٱلسُّحْتَ لَبِئْسَ مَا كَانُواْ يَعْمَلُونَ ﴿٦٢﴾ لَوْلَا يَنْهَىٰهُمُ ٱلرَّبَّٰنِيُّونَ وَٱلْأَحْبَارُ عَن قَوْلِهِمُ ٱلْإِثْمَ وَأَكْلِهِمُ ٱلسُّحْتَ لَبِئْسَ مَا كَانُواْ يَصْنَعُونَ ﴿٦٣﴾ وَقَالَتِ ٱلْيَهُودُ يَدُ ٱللَّهِ مَغْلُولَةٌ غُلَّتْ أَيْدِيهِمْ وَلُعِنُواْ بِمَا قَالُواْ بَلْ يَدَاهُ مَبْسُوطَتَانِ يُنفِقُ كَيْفَ يَشَآءُ وَلَيَزِيدَنَّ كَثِيرًا مِّنْهُم مَّآ أُنزِلَ إِلَيْكَ مِن رَّبِّكَ طُغْيَٰنًا وَكُفْرًا وَأَلْقَيْنَا بَيْنَهُمُ ٱلْعَدَٰوَةَ وَٱلْبَغْضَآءَ إِلَىٰ يَوْمِ ٱلْقِيَٰمَةِ كُلَّمَآ أَوْقَدُواْ نَارًا لِّلْحَرْبِ أَطْفَأَهَا ٱللَّهُ وَيَسْعَوْنَ فِى ٱلْأَرْضِ فَسَادًا وَٱللَّهُ لَا يُحِبُّ ٱلْمُفْسِدِينَ ﴿٦٤﴾

(٥٨) کاتێک ئێوە بانگ دەدەن بۆ نوێژ، بانگ و نوێژەکەتان دەکەنە گەمەوگاڵتە، چونکە ئەوانە کەسانێکن بەڕاستی ژیر نابن و نافامن.

(٥٩) (ئەی محمد ﷺ پێیان) بڵێ: ئەی خاوەنانی کتێب ئەوە بە چی عەیبدار و لەکەدارمان دەکەن و لێمان توڕە دەبن، جگە لەبەر ئەوە نەبێت کە ئێمە بڕوای ڕاست و پتەومان هێناوە بەخواو بەو قورئانەی کە دابەزیووەتە خوارەوە بۆ سەر ئێمە و بەوەی کە پێشتر دابەزیووە؟ یان ئەوەیە کە زۆربەتان یاخی و سەرەڕۆ و تاوانبارن.

(٦٠) پێیان بڵێ: ئایا هەواڵتان بدەمێ بە کردارێک کە تۆڵەکەی لای خوا خراپترە لە تۆڵەی لەکەدارکردنی موسڵمانان، ئەوەش کرداری ئەو کەسەیە کە خوا نەفرینی لێکردوە و جامی خەشم و رقی خۆی ڕژاندووە بەسەریداو هەندێکیشی کردن بە مەیمون و هەندێکیشیان بە بەراز و هەندێکیشیانی کردە طاغوت پەرست و بت پەرست؟! ئا ئەوانە خراپترین جێگە و ڕێگەیان هەیە و گومڕاترین کەسن لە ڕێبازی ڕاست و دروست.

(٦١) ئەوانە کاتێک دێن بۆ لاتان (بە درۆوە دەڵێن) ئێمەش موسوڵمانین و باوەڕمان هێناوە، لە کاتێکدا بەڕاستی ئەوانە بە بێ باوەڕیەوە هاتبوونە ژوورەوە و بێگومان هەر بەبێ باوەڕیشەوە چوونە دەرەوە، جا خوا خۆی چاک دەزانێت کە چیان حەشارداوە لە دڵ و دەروونیاندا.

(٦٢) زۆرێکیش لەوانە دەبینیت کە زۆر بەپەلەو بەهەڵپەن لە زەلکاوی تاوانی درۆو عەیبدارکردنی موسوڵمانان و دەستدرێژیی ناحەق و خواردنی حەرامیان، سوێند بێت بەخوا ئەوەی کە دەیکەن زۆر خراپ و نادروستە.

(٦٣) ئایا ئەوە تاکەی خواناس و زاناکانیان قەدەغەی گوفتاری گوناهو حەرام خۆریيان لێناکەن؟ سوێند بێت ئەو کردەوەو هەڵس و کەوتەی کە دەیکەن بۆ ڕازی کردنی خەڵک زۆر نادروست و خراپ و ناپەسەندە.

(٦٤) ئەو جولەکە (نەفام و خوانەناسانە) دەیانوت: خوا دەستی بەستراوە و خێری لەدەست نابێتەوە!! دەک دەستیان بەستراوو بێ‌خێرو کەلەپچە و تووشی شەلەل بێت، دەک نەفرینیان لێ بێت، بۆ خۆیان و قسەیان، نەخێر، وانیە بەڵکو دوو دەستەی (پڕ لە بەرەکەتی پەروەردگار) هەمیشە و بەردەوام کراوەیە، چۆنی بوێت و چەندی بوێت دەیبەخشێت! سوێند بێت زۆربەیان ئەوەی نێردراوەتە خوارەوە بۆت کە قورئانە لەلایەن پەروەردگارتەوە یاخی بوون و ستەمیان زیاد دەکات و نغرۆیان دەکات لە کوفردا، ئێمەش هەتا ڕۆژی قیامەت دوژمنایەتی و ڕق و کینەمان لەنێوانیاندا بەرپاکردووە، هەر کاتێک دەیانەوێت جەنگ بەرپا بکەن و ئاگری شەڕ هەڵبگیرسێنن خوا دەیکوژێنێتەوە و نایەڵێت تەشەنە بکات، ئەوانە زۆر بەپەلە و بەگەرمی هەوڵی بڵاو بوونەوەی فەسادو تاوان دەدەن لە زەویدا، خوایش ئەو کەسانەی خۆش ناوێت کە تۆوی خراپە دەچێنن.

وَلَوْ أَنَّ أَهْلَ الْكِتَابِ آمَنُوا وَاتَّقَوْا لَكَفَّرْنَا عَنْهُمْ
سَيِّئَاتِهِمْ وَلَأَدْخَلْنَاهُمْ جَنَّاتِ النَّعِيمِ ﴿٦٥﴾ وَلَوْ أَنَّهُمْ أَقَامُوا
التَّوْرَاةَ وَالْإِنجِيلَ وَمَا أُنزِلَ إِلَيْهِم مِّن رَّبِّهِمْ لَأَكَلُوا مِن
فَوْقِهِمْ وَمِن تَحْتِ أَرْجُلِهِم ۚ مِّنْهُمْ أُمَّةٌ مُّقْتَصِدَةٌ ۖ وَكَثِيرٌ مِّنْهُمْ
سَاءَ مَا يَعْمَلُونَ ﴿٦٦﴾ ۞ يَا أَيُّهَا الرَّسُولُ بَلِّغْ مَا أُنزِلَ إِلَيْكَ
مِن رَّبِّكَ ۖ وَإِن لَّمْ تَفْعَلْ فَمَا بَلَّغْتَ رِسَالَتَهُ ۚ وَاللَّهُ يَعْصِمُكَ
مِنَ النَّاسِ ۗ إِنَّ اللَّهَ لَا يَهْدِي الْقَوْمَ الْكَافِرِينَ ﴿٦٧﴾ قُلْ يَا أَهْلَ
الْكِتَابِ لَسْتُمْ عَلَىٰ شَيْءٍ حَتَّىٰ تُقِيمُوا التَّوْرَاةَ وَالْإِنجِيلَ
وَمَا أُنزِلَ إِلَيْكُم مِّن رَّبِّكُمْ ۗ وَلَيَزِيدَنَّ كَثِيرًا مِّنْهُم مَّا أُنزِلَ
إِلَيْكَ مِن رَّبِّكَ طُغْيَانًا وَكُفْرًا ۖ فَلَا تَأْسَ عَلَى الْقَوْمِ الْكَافِرِينَ
﴿٦٨﴾ إِنَّ الَّذِينَ آمَنُوا وَالَّذِينَ هَادُوا وَالصَّابِئُونَ وَالنَّصَارَىٰ
مَنْ آمَنَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ وَعَمِلَ صَالِحًا فَلَا خَوْفٌ
عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ ﴿٦٩﴾ لَقَدْ أَخَذْنَا مِيثَاقَ بَنِي
إِسْرَائِيلَ وَأَرْسَلْنَا إِلَيْهِمْ رُسُلًا ۖ كُلَّمَا جَاءَهُمْ رَسُولٌ بِمَا
لَا تَهْوَىٰ أَنفُسُهُمْ فَرِيقًا كَذَّبُوا وَفَرِيقًا يَقْتُلُونَ ﴿٧٠﴾



(٦٥) خۆ ئەگەر بەڕاستی خاوەنانی کتێب باوەڕیان بهێنایەو پارێزکار بونایە، ئەوە چاوپۆشیمان لە خراپەکانیان دەکردو لێیان خۆش دەبووین و دەمانخستنە ناو بەهەشتی پڕ لە نازو نیعمەتەوە.

(٦٦) خۆ ئەگەر بەڕاستی هەستانایە بەپەیڕەو و پیادە کردنی تەورات و ئینجیل (کە مژدەی زۆری تیایە دەربارەی ئیسلام و محمد ﷺ)و ئەو قورئانەش کە لەلایەن پەروەردگاریانەوە بۆیان هاتووەتە خوارەوە (ئەو کاتە بەروبوومی درەختەکان زۆر و زەبەندە دەکەین و بەرەکەت دەخەینە جیهانی دانەوێڵەو سەوزە و خۆراکەکانی ترەوە)، ئەو کاتە خۆراکیان دەخوارد لە را سەرو لەبەر پێیانەوە، دەستەیەک لەوانە کەسانێکی ژیرو دادپەروەر و میانەڕەو بە ویژدانن، کەچی زۆربەشیان ئەو کاروکردەوەی کە دەیکەن زۆر نادروست و نابەجێیە.

(٦٧) ئەی پێغەمبەرو فرستادە، هەرچی فەرمان و پەیامێکت بۆ دابەزیوە لەلایەن پەروەردگارتەوە (بێ دوودڵی، بێ ماتڵی) رای بگەیەنە، خۆ ئەگەر بەو کارە هەڵنسایت، ئەوە مانای وایە پەیامەکەیت (بەتەواویی) نەگەیاندووە (دڵنیاش بە کە)خوا دەتپارێزێت لە شەڕ و خراپەی خەڵکی، چونکە بەڕاستی خوا هیدایەت و رێنمویی قەوم و هۆزی بێ باوەڕان نادات.

(٦٨) (ئەی محمد ﷺ) بڵێ: ئەی خاوەنانی کتێب، ئێوە لەسەر هیچ بەرنامەو پەیڕەوو پرۆگرامێک نین، هەتا بەچاکی پەیڕەو و پیادەی تەورات و ئینجیل و ئەوەی (لەم دواییەدا، کە قورئانە) نەکەن کە لەلایەن پەروەردگارتانەوە بۆتان دابەزیووە، سوێند بێت بەخوا زۆربەیان ئەوەی نێردراوەتە خوارەوە بۆت لە لایەن پەروەردگارتەوە یاخی بوون و ستەمیان زیاد دەکات و نغرۆیان دەکات لە بێ باوەڕیدا (کەچی لەجیاتی گوێڕایەڵی و ملکەچیی زۆربەیان هەوڵ دەدەن شت هەڵبەستن بۆ ئەو قورئانەی کە بۆمان رەوانە کردوویت)، جا ئیتر خەفەت و پەژارە دات نەگرێت بۆ ئەو گەلە بێباوەڕە، (کاتێک: باوەڕ ناهێنن، کاتێک تۆڵەیان لێ دەکەینەوە لە دنیادا پێش قیامەت).

(٦٩) بەڕاستی ئەوانەی کە ئیمان و باوەڕیان هێناوە (لە ئوممەتی محمد ﷺ) و ئەوانەی کە بوون بە جوو و ئەوانەی صابئەن (فریشتە پەرست و ئەستێرە پەرستن) و گاورەکان، هەر یەک لەو دەستەو تاقمانە ئەگەر باوەڕی دامەزراو بەخواو بە رۆژی دوایی بهێنێت، و کارو کردەوەی چاک و دروست و بەسوود ئەنجام بدات، ئەوانە نەترس و بیم یەخەیان دەگرێت، نەخەم و پەژارە روویان تێدەکات (کاتێک لەبەر رۆشنایی قورئانەوە ئەو باوەڕە دەهێنن).

(٧٠) سوێند بێت بەخوا بێگومان ئێمە پەیمانمان لە نەوەی ئیسرائیل وەرگرتووە (کە لە رێبازی یەکتاناسی و چاکەکاریی لانەدەن)، چەند پێغەمبەرێکیشمان بۆ رەوانە کردوون، هەرکاتێک یەکێک لەو پێغەمبەرانەیان بەدڵ نەبوو بێت (بەهۆی لاساریی و دەروون ئاڵۆزیی خۆیانەوە یاخود بەنارەزووی ئەوانی نەکردبێت) دەستەیەکیان (بەرنامەی پێغەمبەرانیان) بەدرۆ زانیووە، دەستەیەکی تریشیان پەلاماریان داون و (شەهیدیان کردوون).

وَحَسِبُوٓاْ أَلَّا تَكُونَ فِتۡنَةٞ فَعَمُواْ وَصَمُّواْ ثُمَّ تَابَ ٱللَّهُ عَلَيۡهِمۡ ثُمَّ عَمُواْ وَصَمُّواْ كَثِيرٞ مِّنۡهُمۡۚ وَٱللَّهُ بَصِيرُۢ بِمَا يَعۡمَلُونَ ﴿٧١﴾ لَقَدۡ كَفَرَ ٱلَّذِينَ قَالُوٓاْ إِنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلۡمَسِيحُ ٱبۡنُ مَرۡيَمَۖ وَقَالَ ٱلۡمَسِيحُ يَٰبَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ ٱعۡبُدُواْ ٱللَّهَ رَبِّي وَرَبَّكُمۡۖ إِنَّهُۥ مَن يُشۡرِكۡ بِٱللَّهِ فَقَدۡ حَرَّمَ ٱللَّهُ عَلَيۡهِ ٱلۡجَنَّةَ وَمَأۡوَىٰهُ ٱلنَّارُۖ وَمَا لِلظَّٰلِمِينَ مِنۡ أَنصَارٖ ﴿٧٢﴾ لَّقَدۡ كَفَرَ ٱلَّذِينَ قَالُوٓاْ إِنَّ ٱللَّهَ ثَالِثُ ثَلَٰثَةٖۘ وَمَا مِنۡ إِلَٰهٍ إِلَّآ إِلَٰهٞ وَٰحِدٞۚ وَإِن لَّمۡ يَنتَهُواْ عَمَّا يَقُولُونَ لَيَمَسَّنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ مِنۡهُمۡ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿٧٣﴾ أَفَلَا يَتُوبُونَ إِلَى ٱللَّهِ وَيَسۡتَغۡفِرُونَهُۥۚ وَٱللَّهُ غَفُورٞ رَّحِيمٞ ﴿٧٤﴾ مَّا ٱلۡمَسِيحُ ٱبۡنُ مَرۡيَمَ إِلَّا رَسُولٞ قَدۡ خَلَتۡ مِن قَبۡلِهِ ٱلرُّسُلُ وَأُمُّهُۥ صِدِّيقَةٞۖ كَانَا يَأۡكُلَانِ ٱلطَّعَامَۗ ٱنظُرۡ كَيۡفَ نُبَيِّنُ لَهُمُ ٱلۡأٓيَٰتِ ثُمَّ ٱنظُرۡ أَنَّىٰ يُؤۡفَكُونَ ﴿٧٥﴾ قُلۡ أَتَعۡبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ مَا لَا يَمۡلِكُ لَكُمۡ ضَرّٗا وَلَا نَفۡعٗاۚ وَٱللَّهُ هُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلۡعَلِيمُ ﴿٧٦﴾

(٧١) (لەولاشەوە چونكە خۆیان بەخۆشەویستی خوا دادەنا) بەتەما بوون كە تووشی بەڵاو ناخۆشی و سزا نەبن (لە سەرەنجامی لادان و یاخی بوونیان) هەر بۆیە كوێرو كەڕ بوون لە ئاستی حەق و راستیدا، (دوایی كە زانیان زەرەریانە) تەوبەیان كرد، خوایش چاوپۆشی لێكردن، لەوەودوا (تێهەڵچوونەوە لە تاوان و لادان) و زۆربەیان كوێرو كەڕ بوونەوە لەئاستی حەق و راستیدا، خوای گەورەش بینایە بەهەموو ئەو كارانەی كە ئەنجامی دەدەن و (بەسەریاندا تێناپەڕێت).

(٧٢) سوێند بەخوا بەراستی، ئەوانە بێ باوەڕ بوون كە وتیان: خوا هەر مەسیحی كوڕی مەریەمە (بەمەرجێك) مەسیح وتوویەتی: ئەی نەوەی ئیسرائیل، ئەو خوایە بپەرستن كە پەروەردگاری من و پەروەردگاری ئێوەشە و دڵنیابن ئەوەی شەریك و هاوبەش بۆ خوا بڕیار بدات، ئەوە بێگومان خوا بەهەشتی لەسەر حەرامكردووە و شوێن و جێگاو سەرەنجامی ئاگرە، ئەوسا ئەوستەمكارانە هیچ جۆرە پشتیوانێكیان نیە (كەس ناتوانێت فریایان بكەوێت).

(٧٣) سوێند بێت بەخوا بێگومان ئەوانەش بێ باوەڕ بوون كە وتیان: خوا یەكێكە لە سێ دانە خوا (لە حاڵەتێكدا): هیچ خوایەك، هیچ پەروەردگارێك نیە جگە لە خوایەكی تاكو تەنها، خۆ ئەگەر لەو گوفتارە نابەجێ و ناقۆڵایەیان كۆڵ نەدەن، سوێند بەخوا ئەوانەیان كە بێباوەڕ بوون سزایەكی بەئێشیان تووش دەبێت.

(٧٤) ئایا (خاوەنی ئەو بیرو بڕوا پووچانە) حەق نیە تەوبە بكەن و بگەڕێنەوە بۆ لای خواو داوای لێخۆشبوونی لێ بكەن ؟ لەكاتێكدا: خوا لێخۆشبووە و میهرەبانیشە!!

(٧٥) مەسیحی كوڕی مەریەم هیچ شتێك نیە (نە خوایە و نە كوڕی خوایە) جگە پێغەمبەرێكی خوا نەبێت، بە راستی پێش ئەو چەندەها پێغەمبەری تریش رابوردوون، دایكیشی ئافرەتێكی زۆر راست و راستگۆیە، هەردووكیان خواردنیان دەخوارد (وەكو هەموو ئینسانێك) سەیر بكە و سەرنج بدە (ئەی محمد ﷺ، ئەی ئیماندار) چۆن هەموو فەرمان و بەڵگەیەكیان بۆ روون دەكەینەوە، لەوەودوا تەماشاكە چۆن روویان لە حەق وەردەچەرخێنرێت و لەراستی لادەدرێن!

(٧٦) پێیان بڵێ: ئایا (ئەوە راستە) لە جیاتی خوا شتێك دەپەرستن كە نە زەرەرتانی بەدەستە نە قازانج، (بەڵكو) هەر خوا خۆی بیسەرو زانایە (ئەو شتانەی ئێوە بەدەوریدا دێن هیچیان لە دەست نایەت).

قُلْ يَٰٓأَهْلَ ٱلْكِتَٰبِ لَا تَغْلُوا۟ فِى دِينِكُمْ غَيْرَ ٱلْحَقِّ وَلَا تَتَّبِعُوٓا۟ أَهْوَآءَ قَوْمٍ قَدْ ضَلُّوا۟ مِن قَبْلُ وَأَضَلُّوا۟ كَثِيرًا وَضَلُّوا۟ عَن سَوَآءِ ٱلسَّبِيلِ ﴿٧٧﴾ لُعِنَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ مِنۢ بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ عَلَىٰ لِسَانِ دَاوُۥدَ وَعِيسَى ٱبْنِ مَرْيَمَ ۚ ذَٰلِكَ بِمَا عَصَوا۟ وَّكَانُوا۟ يَعْتَدُونَ ﴿٧٨﴾ كَانُوا۟ لَا يَتَنَاهَوْنَ عَن مُّنكَرٍ فَعَلُوهُ ۚ لَبِئْسَ مَا كَانُوا۟ يَفْعَلُونَ ﴿٧٩﴾ تَرَىٰ كَثِيرًا مِّنْهُمْ يَتَوَلَّوْنَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ ۚ لَبِئْسَ مَا قَدَّمَتْ لَهُمْ أَنفُسُهُمْ أَن سَخِطَ ٱللَّهُ عَلَيْهِمْ وَفِى ٱلْعَذَابِ هُمْ خَٰلِدُونَ ﴿٨٠﴾ وَلَوْ كَانُوا۟ يُؤْمِنُونَ بِٱللَّهِ وَٱلنَّبِىِّ وَمَآ أُنزِلَ إِلَيْهِ مَا ٱتَّخَذُوهُمْ أَوْلِيَآءَ وَلَٰكِنَّ كَثِيرًا مِّنْهُمْ فَٰسِقُونَ ﴿٨١﴾ ۞ لَتَجِدَنَّ أَشَدَّ ٱلنَّاسِ عَدَٰوَةً لِّلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱلْيَهُودَ وَٱلَّذِينَ أَشْرَكُوا۟ ۖ وَلَتَجِدَنَّ أَقْرَبَهُم مَّوَدَّةً لِّلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱلَّذِينَ قَالُوٓا۟ إِنَّا نَصَٰرَىٰ ۚ ذَٰلِكَ بِأَنَّ مِنْهُمْ قِسِّيسِينَ وَرُهْبَانًا وَأَنَّهُمْ لَا يَسْتَكْبِرُونَ ﴿٨٢﴾

الجزء ٧ الحزب ٣

(٧٧) هەروەها بڵێ: ئەی خاوەنانی کتێب زیادەڕەوی مەکەن لە ئاینەکەتاندا بەزیادەڕەوی نابەجێ و لە سنووری حەق و ڕاستی دەرمەچن، شوێنی ئارەزووی ئەو کەسانە مەکەون کە بێگومان پێشان گومڕا بوون و زۆر کەسیشیان گومڕا کردو ئەوانیش لەو ڕێگەو ڕێبازە ڕاستە لایاندا.

(٧٨) نەفرین کراوە لەوانەی: بێ باوەڕ بوون لە نەوەی ئیسرائیل لەسەر زاری داودو عیسای کوڕی مەریەم، ئەمەش لەبەر ئەوەی کە ئەوان یاخی و سەرکەش بوون و دەستدرێژیان دەکرد.

(٧٩) ئەوانە قەدەغەی یەکتریان نەدەکرد لە خراپەو تاوانێک کە دەیانکرد، سوێند بێت بەخوا ئەوەی کە دەیکەن زۆر خراپ و ناپەسەندە!

(٨٠) زۆربەیان دەبینیت ڕازین بەخۆشەویستی و پشتیوانی ئەوانەی کە بێ باوەڕ بوون، سوێند بە خوا دەست پێشکەرییەکی خراپیان بۆ خۆیان ئەنجامداوە کە خوایان لە خۆیان تووڕە کردووە (بەو کارەیان)، (لە قیامەتیشدا) لەناو سزای دۆزەخدا دەبێت بۆ هەمیشە بمێننەوە.

(٨١) خۆ ئەگەر ئەوانە باوەڕیان بەخواو بەم پێغەمبەرەو ئەو قورئانە ببوایە کە بۆی دابەزیوە، ئەوە ئەوانەیان نەدەکرد بەخۆشەویست و سەرپەرشتیاری خۆیان، پشتیان بەوان نەدەبەست، بەڵام زۆربەیان تاوانبارو لادەرو یاخین و (حەق و ڕاستی مەبەستیان نیە، بەڵکو بەردەوام دژایەتی ئاینی ئیسلام دەکەن).

(٨٢) سوێند بەخوا دەبینیت و دەستت دەکەوێت سەر سەخترینی خەڵک لە دوژمنایەتیدا بەرامبەر بەوانەی کە باوەڕیان هێناوە، جولەکەن و ئەوانەی کە هاوەڵیان بۆ خوا داناوە و سوێند بێت دەبینیت و دەستت دەکەوێت نزیکترینیان لە سۆز و خۆشەویستی بۆ ئەوانەی کە باوەڕیان هێناوە ئەوانەن کە دەیانوت: بەڕاستی ئێمە نەصرانین، ئەوەش لەبەر ئەوەیە بەڕاستی هەندێک لەوان قەشەی دیندارن و هەندێکیشیان گۆشەگیرو کەسانی خواپەرستن و بێگومان ئەوان خۆ بەگەورە دانانێن.

وَإِذَا سَمِعُوا مَا أُنزِلَ إِلَى الرَّسُولِ تَرَىٰ أَعْيُنَهُمْ تَفِيضُ مِنَ الدَّمْعِ مِمَّا عَرَفُوا مِنَ الْحَقِّ يَقُولُونَ رَبَّنَا آمَنَّا فَاكْتُبْنَا مَعَ الشَّاهِدِينَ ﴿٨٣﴾ وَمَا لَنَا لَا نُؤْمِنُ بِاللَّهِ وَمَا جَاءَنَا مِنَ الْحَقِّ وَنَطْمَعُ أَن يُدْخِلَنَا رَبُّنَا مَعَ الْقَوْمِ الصَّالِحِينَ ﴿٨٤﴾ فَأَثَابَهُمُ اللَّهُ بِمَا قَالُوا جَنَّاتٍ تَجْرِي مِن تَحْتِهَا الْأَنْهَارُ خَالِدِينَ فِيهَا ۚ وَذَٰلِكَ جَزَاءُ الْمُحْسِنِينَ ﴿٨٥﴾ وَالَّذِينَ كَفَرُوا وَكَذَّبُوا بِآيَاتِنَا أُولَٰئِكَ أَصْحَابُ الْجَحِيمِ ﴿٨٦﴾ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تُحَرِّمُوا طَيِّبَاتِ مَا أَحَلَّ اللَّهُ لَكُمْ وَلَا تَعْتَدُوا ۚ إِنَّ اللَّهَ لَا يُحِبُّ الْمُعْتَدِينَ ﴿٨٧﴾ وَكُلُوا مِمَّا رَزَقَكُمُ اللَّهُ حَلَالًا طَيِّبًا ۚ وَاتَّقُوا اللَّهَ الَّذِي أَنتُم بِهِ مُؤْمِنُونَ ﴿٨٨﴾ لَا يُؤَاخِذُكُمُ اللَّهُ بِاللَّغْوِ فِي أَيْمَانِكُمْ وَلَٰكِن يُؤَاخِذُكُم بِمَا عَقَّدتُّمُ الْأَيْمَانَ ۖ فَكَفَّارَتُهُ إِطْعَامُ عَشَرَةِ مَسَاكِينَ مِنْ أَوْسَطِ مَا تُطْعِمُونَ أَهْلِيكُمْ أَوْ كِسْوَتُهُمْ أَوْ تَحْرِيرُ رَقَبَةٍ ۖ فَمَن لَّمْ يَجِدْ فَصِيَامُ ثَلَاثَةِ أَيَّامٍ ۚ ذَٰلِكَ كَفَّارَةُ أَيْمَانِكُمْ إِذَا حَلَفْتُمْ ۚ وَاحْفَظُوا أَيْمَانَكُمْ ۚ كَذَٰلِكَ يُبَيِّنُ اللَّهُ لَكُمْ آيَاتِهِ لَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ ﴿٨٩﴾

(٨٣) (ئەوانەیان کە بەشوێن راستیدا دەگەڕێن) هەر کاتێک گوێیان لە قورئان دەبوو کە بۆ پێغەمبەر ﷺ دابەزیووە، دەبینیت چاوەکانیان ئەسرینی خۆشی هەڵدەڕێژێت، بەهۆی ئەو حەق و راستیەی کە دەیانناسی، لەکاتێکدا دەڵێن: پەروەردگارا ئێمە ئیمان و باوەڕمان هێناوە (بە ئاینی ئیسلام) دە تۆش لە ریزی (پەیڕەوان) و شایەتەکاندا تۆمارمان بکە.

(٨٤) چی ڕێمان لێدەگرێت باوەڕ نەهێنین بە خواو بەوەی بۆمان هاتووە لە حەق و راستی، هیواداریشین کە پەروەردگارمان بمانخاتە نێو ریزی چاکان و گونجاوان بۆ خواپەرستی.

(٨٥) جا بەهۆی ئەوگوفتارە بەجێیەیان پاداشتی دانەوە، بەوەی باخەکانی بەهەشتیان پێ دەبەخشێت کە چەندەها رووبار بەژێر درەختەکانیدا دەڕوات، هاوڕێ لەگەڵ ژیانی هەمیشەیی و نەبڕاوەدا، هەر بەو شێوەیەشە پاداشتی چاکەکاران.

(٨٦) ئەوانەش باوەڕیان نەهێناوە و ئایەت و فەرمانەکانی ئێمەیان بە درۆزانی، ئا ئەوانە نیشتەجێی ناو دۆزەخن.

(٨٧) ئەی ئەوانەی کە باوەڕتان هێناوە، ئەو نازو نیعمەتە چاکانەی کە خوا بۆی حەڵاڵ کردوون لە خۆتانی حەرام مەکەن و لە سنوور دەرمەچن و دەستدرێژیی مەکەن، چونکە بەڕاستی خوا دەست درێژکارانی خۆشناوێت.

(٨٨) لەو رزق و رۆزییە حەڵاڵ و پاکانە بخۆن کە خوا پێی بەخشیوون، لەو خوایە بترسن کە ئێوە هەمیشە باوەڕی دامەزراوتان پێیەتی (خۆتان لە رزق و رۆزیی حەرام بپارێزن).

(٨٩) خوا لێتان ناگرێت کاتێک بەسادەیی سوێند بەدەمتاندا دێت و (لەسەری راهاتوون) بەڵکو لەو سوێندانەتان دەپرسێتەوە کە بیرو هۆشتان لای هەبووە و بۆ مەبەستێک وتووتانە، جا کەفارەتی ئەو جۆرە سوێندانە: نان و خۆراک دانە بە دە کەسی هەژار بەشێوەیەکی مامناوەندی کە بۆ خاو و خێزانتان سەرفی دەکەن، یاخود پۆشتە کردنەوەیان یاخود ئازاد کردنی بەندەیەک (ئەگەر بووی) ئەوەی (توانای ئەو شتانەی نەبوو) با سێ رۆژ بەڕۆژوو بێت، ئەوە کەفارەتی سوێندەکانتانە کاتێک سوێند دەخۆن و نایبەنە سەر، جا تادەتوانن سوێندەکانتان بپارێزن و مەیانشکێنن، ئا بەو شێوەیە خوا ئایەتەکانی خۆیتان بۆ روون دەکاتەوە بۆ ئەوەی سوپاسگوزاری بکەن.

يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ إِنَّمَا ٱلْخَمْرُ وَٱلْمَيْسِرُ وَٱلْأَنصَابُ وَٱلْأَزْلَٰمُ رِجْسٌ مِّنْ عَمَلِ ٱلشَّيْطَٰنِ فَٱجْتَنِبُوهُ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ ﴿٩٠﴾ إِنَّمَا يُرِيدُ ٱلشَّيْطَٰنُ أَن يُوقِعَ بَيْنَكُمُ ٱلْعَدَٰوَةَ وَٱلْبَغْضَآءَ فِى ٱلْخَمْرِ وَٱلْمَيْسِرِ وَيَصُدَّكُمْ عَن ذِكْرِ ٱللَّهِ وَعَنِ ٱلصَّلَوٰةِ فَهَلْ أَنتُم مُّنتَهُونَ ﴿٩١﴾ وَأَطِيعُوا۟ ٱللَّهَ وَأَطِيعُوا۟ ٱلرَّسُولَ وَٱحْذَرُوا۟ فَإِن تَوَلَّيْتُمْ فَٱعْلَمُوٓا۟ أَنَّمَا عَلَىٰ رَسُولِنَا ٱلْبَلَٰغُ ٱلْمُبِينُ ﴿٩٢﴾ لَيْسَ عَلَى ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ جُنَاحٌ فِيمَا طَعِمُوٓا۟ إِذَا مَا ٱتَّقَوا۟ وَّءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ ثُمَّ ٱتَّقَوا۟ وَّءَامَنُوا۟ ثُمَّ ٱتَّقَوا۟ وَّأَحْسَنُوا۟ وَٱللَّهُ يُحِبُّ ٱلْمُحْسِنِينَ ﴿٩٣﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَيَبْلُوَنَّكُمُ ٱللَّهُ بِشَىْءٍ مِّنَ ٱلصَّيْدِ تَنَالُهُۥٓ أَيْدِيكُمْ وَرِمَاحُكُمْ لِيَعْلَمَ ٱللَّهُ مَن يَخَافُهُۥ بِٱلْغَيْبِ فَمَنِ ٱعْتَدَىٰ بَعْدَ ذَٰلِكَ فَلَهُۥ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿٩٤﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَا تَقْتُلُوا۟ ٱلصَّيْدَ وَأَنتُمْ حُرُمٌ وَمَن قَتَلَهُۥ مِنكُم مُّتَعَمِّدًا فَجَزَآءٌ مِّثْلُ مَا قَتَلَ مِنَ ٱلنَّعَمِ يَحْكُمُ بِهِۦ ذَوَا عَدْلٍ مِّنكُمْ هَدْيًۢا بَٰلِغَ ٱلْكَعْبَةِ أَوْ كَفَّٰرَةٌ طَعَامُ مَسَٰكِينَ أَوْ عَدْلُ ذَٰلِكَ صِيَامًا لِّيَذُوقَ وَبَالَ أَمْرِهِۦ عَفَا ٱللَّهُ عَمَّا سَلَفَ وَمَنْ عَادَ فَيَنتَقِمُ ٱللَّهُ مِنْهُ وَٱللَّهُ عَزِيزٌ ذُو ٱنتِقَامٍ ﴿٩٥﴾

(٩٠) ئەی ئەوانەی کە باوەڕتان هێناوە دڵنیابن کە عەرەق و قومارو گۆشتی ماڵاتی سەربڕاو بۆ غەیری خوا لەو شوێنانەی کە خەڵک بەپیرۆزی داناوە نەک ئیسلام، بورج و حەرام و حەلاڵ زانین بەهۆی هەڵدانی زارەوە ئەمانە هەرپیسن و لەکارُوکردەوەی شەیتانن، کەواتە ئێوەش خۆتانی لێ دوور بگرن و خۆتانی لێ بپارێزن، بۆ ئەوەی سەرفرازیی و بەختەوەریی بەدەست بهێنن (لە هەردوو جیهاندا).

(٩١) بەڕاستی شەیتان هەر دەیەوێت لە ڕێگەی عەرەق و قومارەوە دوژمنایەتی و بوغزو کینە بخاتە نێوانتانەوە و لەیادکردنی خوا و ناوە پیرۆزەکانی وێڵتان بکات، هەروەها سست و تەمەڵتان بکات لە ئەنجامدانی نوێژەکان بە شێنەیی، ئایا ئیتر بەس نیە؟ ئایا کۆڵ نادەن؟! (جا هەر کە ئەم ئایەتە پیرۆزە هاتە خوارەوە، جاڕ درا بە ناو شاری مەدینەدا کە عەرەق حەرام کراوە، ئەوسا ئیمانداران قەرابە و گۆزە و دیزە و هەرچی عەرەقی تیادا بوو ڕشتیانە کۆڵان).

(٩٢) (ئەی ئیمانداران) فەرمانبەرداری خوا بن، فەرمانبەرداری پێغەمبەریش بن و وریابن و ئاگادار بن (نەکەن سەرپێچی لە فەرمان و ڕێنموویيەکانیان بکەن) جا ئەگەر پشت هەڵکەن و یاخی ببن ئەوە بزانن بەڕاستی کاری پێغەمبەری ئێمە تەنها ڕاگەیاندنی ئاشکراو ڕوونی پەیامەکەیە.

(٩٣) هیچ گوناهێک نیە لەسەر ئەوانەی کە باوەڕیان هێناوە و کردارە چاکەکانیان ئەنجامداوە لەوەی کە خواردویانە و خواردویانەتەوە (پێش حەرامکردنیان)، کاتێک خۆیان پاراستبێت لە حەرامی ئەو سەردەمە و بڕوایان هەبوو بێت و کردارە چاکەکانیان ئەنجام دابێت و پاشان لە تازە حەرام کراوەکانیش خۆیان پاراستبێت و باوەڕیان هێنا بێت لە دوایدا خۆیان پاراستبێت و بەردەوامیش بووبن لەسەر چاکەکردن، خوایش چاکەکارانی خۆش دەوێت (چاوپۆشی لە ڕابوردوویان دەکات).

(٩٤) ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە سوێند بێت بێگومان خوای گەورە تاقیتان دەکاتەوە بەشتی کەم هەندێکیان لە نێچیری کێوین کە دێنە پێشەوە لێتان و دەتوانن بەدەست بیانگرن و بە ڕمەکانتان ڕاویان بکەن (لەکاتی ئیحرامدا بۆ حەج و عەمرە) تا بە تەواوی لە جیهانی واقعدا خوا بزانێت کە کێ لە پەنهانیدا دەترسێت لە خوا، جا ئەوەی دەستدرێژی و نافەرمانی کردبێت لە دوای ئەو تاقی کردنەوەیە (لەکاتی ئیحرامدا) ئەوە سزای بەئێشی بۆ هەیە.

(٩٥) ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە لەکاتێکدا ئێوە لە ئیحرامدان (نیەتی حەج یا عەمرەتان هێناوە) نێچیر ڕاو مەکەن، ئەوەی بەئارەزوو ڕاو بکات و نێچیر بکوژێت لە تۆڵەیدا دەبێت قوربانیەکی وەک ئەو نێچیرە پێشکەش بکات و ئەو بڕیارەش دەبێت دووکەسی شارەزای دادپەروەر لە خۆتان بیدەن و قوربانیەکەش دەبێت پێشکەش بکرێت لە دەوروبەری کەعبەدا، یاخود بەقەدەر نرخی قۆچەکە خۆراک پێشکەش بەهەژاران بکات، یاخود بەقەدەر ژمارەی هەژاران (کە خۆراکیان بەردەکەوێت) بەڕۆژوو بێت، تا تاڵاوی سەرپێچی خۆی بچێژێت، لە ڕابوردووشدا هەرچی لەو بابەتانە ڕوویداوە خوا قەڵەمی چاوپۆشی بەسەردا هێناوە، جا ئەوەی ئەم هەڵانە دووبارە بکاتەوە خوا تۆڵەی لێدەسێنێت، چونکە خوا باڵادەست و تۆڵە سێنەرێکی (بە زەبرە).



أُحِلَّ لَكُمْ صَيْدُ ٱلْبَحْرِ وَطَعَامُهُۥ مَتَٰعًا لَّكُمْ وَلِلسَّيَّارَةِ ۖ وَحُرِّمَ عَلَيْكُمْ صَيْدُ ٱلْبَرِّ مَا دُمْتُمْ حُرُمًا ۗ وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ ٱلَّذِىٓ إِلَيْهِ تُحْشَرُونَ ﴿٩٦﴾ ۞ جَعَلَ ٱللَّهُ ٱلْكَعْبَةَ ٱلْبَيْتَ ٱلْحَرَامَ قِيَٰمًا لِّلنَّاسِ وَٱلشَّهْرَ ٱلْحَرَامَ وَٱلْهَدْىَ وَٱلْقَلَٰٓئِدَ ۚ ذَٰلِكَ لِتَعْلَمُوٓا۟ أَنَّ ٱللَّهَ يَعْلَمُ مَا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِى ٱلْأَرْضِ وَأَنَّ ٱللَّهَ بِكُلِّ شَىْءٍ عَلِيمٌ ﴿٩٧﴾ ٱعْلَمُوٓا۟ أَنَّ ٱللَّهَ شَدِيدُ ٱلْعِقَابِ وَأَنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿٩٨﴾ مَّا عَلَى ٱلرَّسُولِ إِلَّا ٱلْبَلَٰغُ ۗ وَٱللَّهُ يَعْلَمُ مَا تُبْدُونَ وَمَا تَكْتُمُونَ ﴿٩٩﴾ قُل لَّا يَسْتَوِى ٱلْخَبِيثُ وَٱلطَّيِّبُ وَلَوْ أَعْجَبَكَ كَثْرَةُ ٱلْخَبِيثِ ۚ فَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ يَٰٓأُو۟لِى ٱلْأَلْبَٰبِ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ ﴿١٠٠﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَا تَسْـَٔلُوا۟ عَنْ أَشْيَآءَ إِن تُبْدَ لَكُمْ تَسُؤْكُمْ وَإِن تَسْـَٔلُوا۟ عَنْهَا حِينَ يُنَزَّلُ ٱلْقُرْءَانُ تُبْدَ لَكُمْ عَفَا ٱللَّهُ عَنْهَا ۗ وَٱللَّهُ غَفُورٌ حَلِيمٌ ﴿١٠١﴾ قَدْ سَأَلَهَا قَوْمٌ مِّن قَبْلِكُمْ ثُمَّ أَصْبَحُوا۟ بِهَا كَٰفِرِينَ ﴿١٠٢﴾ مَا جَعَلَ ٱللَّهُ مِنۢ بَحِيرَةٍ وَلَا سَآئِبَةٍ وَلَا وَصِيلَةٍ وَلَا حَامٍ ۙ وَلَٰكِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ يَفْتَرُونَ عَلَى ٱللَّهِ ٱلْكَذِبَ ۖ وَأَكْثَرُهُمْ لَا يَعْقِلُونَ ﴿١٠٣﴾

(٩٦) راوکردن و خواردنی زیندەوەرانی دەریایی بۆتان حەلاڵ کراوە، لەبەر سوودی ئێوە و ئەو کەسانەش کە لە سەفەردان و راوی زیندەوەرانی دەشتی و کێوی لێتان حەرامە هەتا لە ئیحرامدا بن، لەو خوایە بترسن کە هەر بۆ لای ئەو کۆ دەکرێنەوە (بۆ لێپرسینەوە).

(٩٧) خوا، کەعبە کە (البیت الحرام)ە کردوویەتی بەهۆی هەستانەوە و بوژانەوەی خەڵکی (لە هەردوو دنیادا)، هەروەها مانگە حەرامەکانیش و دیاریی و قوربانیە دیاری کراوەکان، ئەوەش بۆ ئەوەیە چاک بزانن و دڵنیا بن کە خوا ئاگادارە بەهەرچی لە ئاسمانەکاندایە و بەهەرچی لە زەویدا هەیە، بەڕاستی خوا بە هەموو شتێک زانایە.

(٩٨) چاک بزانن بەڕاستی خوا تۆڵەسێنەرێکی توند و تیژە (لە یاخیەکان) هەروەها بێگومان لێخۆشبوو و میهرەبانە (بۆ ئیمانداران).

(٩٩) پێغەمبەر هیچی لەسەر نییە جگە لە راگەیاندنی پەیامی خوا، هەر خوا خۆیشی دەزانێت بەوەی دەریدەخەن، بەوەش دەیشارنەوە (لە کردارو گوفتارو نیەتتان).

(١٠٠) (ئەی پێغەمبەر ﷺ) پێیان بڵێ: پیس و پاک یەکسان نین، هەرچەندە زۆریەتی ئەو پیسە سەرنجی راکێشا بێت، کەواتە ئەی هۆشمەندان لە خوا بترسن و پارێزکار بن، بۆ ئەوەی سەرفراز و سەرکەوتووبن.

(١٠١) ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە پرسیار مەکەن لە هەندێک شت، کە ئەگەر ئاشکرا بکرێت بۆتان سەغڵەتتان دەکات، خۆ ئەگەر پرسیار بکەن دەربارەیان لەکاتی دابەزاندنی قورئاندا ئەوە بۆتان ئاشکرا دەکرێت، خوا چاوپۆشی لێ کردوون و (باسی نەکردوون) خواش لێخۆشبوو و بەحیلم و حەوسەڵەیە.

(١٠٢) بێگومان کەسانێک پێش ئێوە پرسیاریان دەربارەیان کرد، پاشان کە بۆیان روون دەبۆوە بڕوایان پێ نەدەکرد و پێی بێ باوەڕ بوون (کەواتە ئێوە وامەبن).

(١٠٣) خوا بڕیاری ئەوەی نەداوە کە وشتر گوێی ببڕدرێت یان بەرەڵا بکرێت، یان بەرخۆلەی مەڕەکان بۆ بتەکان سەر ببڕدرێت، یان وشتری نێر ئازاد بێت، بەڵام ئەوانەی بێباوەڕ بوون درۆیان بەدەم خواوە هەڵدەبەست، زۆربەشیان ژیر نابن (هەر لە خۆیانەوە بڕیاری نابەجێ دەدەن و کرداری ناپەسەند دەکەن).

وَإِذَا قِيلَ لَهُمْ تَعَالَوْا إِلَىٰ مَا أَنزَلَ اللَّهُ وَإِلَى الرَّسُولِ قَالُوا
حَسْبُنَا مَا وَجَدْنَا عَلَيْهِ آبَاءَنَا ۚ أَوَلَوْ كَانَ آبَاؤُهُمْ لَا يَعْلَمُونَ
شَيْئًا وَلَا يَهْتَدُونَ ﴿١٠٤﴾ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا عَلَيْكُمْ أَنفُسَكُمْ ۖ
لَا يَضُرُّكُم مَّن ضَلَّ إِذَا اهْتَدَيْتُمْ ۚ إِلَى اللَّهِ مَرْجِعُكُمْ جَمِيعًا
فَيُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴿١٠٥﴾ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا شَهَادَةُ
بَيْنِكُمْ إِذَا حَضَرَ أَحَدَكُمُ الْمَوْتُ حِينَ الْوَصِيَّةِ اثْنَانِ ذَوَا
عَدْلٍ مِّنكُمْ أَوْ آخَرَانِ مِنْ غَيْرِكُمْ إِنْ أَنتُمْ ضَرَبْتُمْ فِي الْأَرْضِ
فَأَصَابَتْكُم مُّصِيبَةُ الْمَوْتِ ۚ تَحْبِسُونَهُمَا مِن بَعْدِ الصَّلَاةِ
فَيُقْسِمَانِ بِاللَّهِ إِنِ ارْتَبْتُمْ لَا نَشْتَرِي بِهِ ثَمَنًا وَلَوْ كَانَ ذَا قُرْبَىٰ ۙ
وَلَا نَكْتُمُ شَهَادَةَ اللَّهِ إِنَّا إِذًا لَّمِنَ الْآثِمِينَ ﴿١٠٦﴾ فَإِنْ عُثِرَ عَلَىٰ
أَنَّهُمَا اسْتَحَقَّا إِثْمًا فَآخَرَانِ يَقُومَانِ مَقَامَهُمَا مِنَ الَّذِينَ
اسْتَحَقَّ عَلَيْهِمُ الْأَوْلَيَانِ فَيُقْسِمَانِ بِاللَّهِ لَشَهَادَتُنَا أَحَقُّ
مِن شَهَادَتِهِمَا وَمَا اعْتَدَيْنَا إِنَّا إِذًا لَّمِنَ الظَّالِمِينَ ﴿١٠٧﴾ ذَٰلِكَ
أَدْنَىٰ أَن يَأْتُوا بِالشَّهَادَةِ عَلَىٰ وَجْهِهَا أَوْ يَخَافُوا أَن تُرَدَّ أَيْمَانٌ بَعْدَ
أَيْمَانِهِمْ ۗ وَاتَّقُوا اللَّهَ وَاسْمَعُوا ۗ وَاللَّهُ لَا يَهْدِي الْقَوْمَ الْفَاسِقِينَ ﴿١٠٨﴾

(١٠٤) هەر کاتێک پێیان بوترێت: وەرن بۆ لای ئەوەی خوا دایبەزاندووە و وەرن بۆ لای پێغەمبەریش (بۆ ئەوەی داوەری بکات لە نێوانتاندا) ئەوە دەڵێن: هەر ئەو بەرنامەیەمان بەسە کە باوو باپیرانمان لەسەری بوون و لە مامۆستاو رابەرانمانەوە فێری بوین و بۆمان ماوەتەوە، ئایا ئەگەر کاتێکیش باوان و مامۆستایانیان هیچ شتێک لە حەرام و حەڵاڵ نەزانن و رێنموویش وەرنەگرن، ئەوە هەرشوێنیان دەکەون؟!

(١٠٥) ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە هەمیشەو بەردەوام سەرگەرمی پەروەردەی خۆتان بن و (مەترسن)، چونکە ئەوانەی گومڕان ناتوانن زیانتان لێبدەن ئەگەر ئێوە بەچاکی رێبازی هیدایەت و خواناسیتان گرتبێتە بەر، دڵنیابن گەڕانەوەی هەموو شتێک بۆلای خوایە، سەرەنجام هەواڵی هەموو ئەو کارو کردەوانەتان دەداتێ کە ئەنجامی دەدەن.

(١٠٦) ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە: کاتێک نیشانەی مەرگ و مردن لە کەسێکتان دەرکەوت ، شایەتی نێوانتان با دووکەس بن لەکاتی وەسیەتەکەدا، دووکەسی دادپەروەر بن لە خۆتان یان دوو کەسی تر جگە لە خۆتان، ئەگەر ئێوە بۆ بازرگانی و شتی تر سەفەرتان کرد لە وڵاتداو جا مردن یەخەی گرتن، ئەگەر دوودڵ بوون لە دوو شایەتەکە ئەوا رایانگرن لە دوای نوێژی عەسر سوێند بخۆن بەخواو (بڵێین) ئێمە سوێندەکەمان بەهیچ نرخێک ناگۆڕینەوە با سوێند بۆ خوراوەکە نزیکترین خزمیش بێت (لە راستی لا نادەین)، ئێمە شایەتیەک کە بۆ خوا ئەنجاممانداوە نایشارینەوە و ونی ناکەین، چونکە بەڕاستی ئەگەر وابکەین ئەوە کەوابوو بێگومان لە ریزی تاوانباراندایین.

(١٠٧) خۆ ئەگەر دەرکەوت ئەو دوو شایەتەی پێشوو(درۆیان کردووەو) خۆیان گوناهبار کردووە ئەوە دووکەسی تر لە خزمی نزیکی ستەم لێکراوی مردووەکە لە جیاتی ئەوان ئامادە بکرێن و ئینجا سوێند بەخوا بخۆن و بڵێین: کە بە راستی شایەتی ئێمە لە شایەتی ئەوان راستترو دروستترە، ئێمە هیچ ستەم و دەستدرێژیەکمان نەکردووە و(تەماعمان لە ماڵیاندا نیە)، خۆ ئەگەر نیەتمان وابێت، ئەوە بەراستی کەوابوو ئێمەش لە ریزی ستەمکاراندایین.

(١٠٨) ئەوەی کە باسکرا نزیکترین و شیاوترین شێوازە بۆ شایەتی جێبەجێ کردن بۆ ئەوەی سوێند و شایەتیەکان بە ڕاستی بدرێن لەبەر خوا یان لە ترسی ئابڕوو چوونی بەدرۆ خستنەوەی سوێندەکانیان (تا مافی کەس نەفەوتێت)، لە خوا بترسن و گوێ بگرن (بۆ هەموو رێنموییەکی خێر) خوایش هیدایەت و رێنموویی هۆزو قەومی تاوانبارو گوناهکارو لە سنوور دەرچوو نادات.

﴿يَوۡمَ يَجۡمَعُ ٱللَّهُ ٱلرُّسُلَ فَيَقُولُ مَاذَآ أُجِبۡتُمۡۖ قَالُواْ لَا عِلۡمَ لَنَآۖ إِنَّكَ أَنتَ عَلَّٰمُ ٱلۡغُيُوبِ ١٠٩ إِذۡ قَالَ ٱللَّهُ يَٰعِيسَى ٱبۡنَ مَرۡيَمَ ٱذۡكُرۡ نِعۡمَتِي عَلَيۡكَ وَعَلَىٰ وَٰلِدَتِكَ إِذۡ أَيَّدتُّكَ بِرُوحِ ٱلۡقُدُسِ تُكَلِّمُ ٱلنَّاسَ فِي ٱلۡمَهۡدِ وَكَهۡلٗاۖ وَإِذۡ عَلَّمۡتُكَ ٱلۡكِتَٰبَ وَٱلۡحِكۡمَةَ وَٱلتَّوۡرَىٰةَ وَٱلۡإِنجِيلَۖ وَإِذۡ تَخۡلُقُ مِنَ ٱلطِّينِ كَهَيۡـَٔةِ ٱلطَّيۡرِ بِإِذۡنِي فَتَنفُخُ فِيهَا فَتَكُونُ طَيۡرَۢا بِإِذۡنِيۖ وَتُبۡرِئُ ٱلۡأَكۡمَهَ وَٱلۡأَبۡرَصَ بِإِذۡنِيۖ وَإِذۡ تُخۡرِجُ ٱلۡمَوۡتَىٰ بِإِذۡنِيۖ وَإِذۡ كَفَفۡتُ بَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ عَنكَ إِذۡ جِئۡتَهُم بِٱلۡبَيِّنَٰتِ فَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ مِنۡهُمۡ إِنۡ هَٰذَآ إِلَّا سِحۡرٞ مُّبِينٞ ١١٠ وَإِذۡ أَوۡحَيۡتُ إِلَى ٱلۡحَوَارِيِّـۧنَ أَنۡ ءَامِنُواْ بِي وَبِرَسُولِي قَالُوٓاْ ءَامَنَّا وَٱشۡهَدۡ بِأَنَّنَا مُسۡلِمُونَ ١١١ إِذۡ قَالَ ٱلۡحَوَارِيُّونَ يَٰعِيسَى ٱبۡنَ مَرۡيَمَ هَلۡ يَسۡتَطِيعُ رَبُّكَ أَن يُنَزِّلَ عَلَيۡنَا مَآئِدَةٗ مِّنَ ٱلسَّمَآءِۖ قَالَ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ إِن كُنتُم مُّؤۡمِنِينَ ١١٢ قَالُواْ نُرِيدُ أَن نَّأۡكُلَ مِنۡهَا وَتَطۡمَئِنَّ قُلُوبُنَا وَنَعۡلَمَ أَن قَدۡ صَدَقۡتَنَا وَنَكُونَ عَلَيۡهَا مِنَ ٱلشَّٰهِدِينَ ١١٣﴾

(١٠٩) رۆژێک دێت، خوا هەموو پێغەمبەران کۆدەکاتەوە، ئینجا پێیان دەفەرموێت: چۆن وەڵامتان درایەوەو خەڵکی هەڵوێستیان چۆن بوو بەرامبەرتان؟ تا چ رادەیەک هاتن بەدەمتانەوە؟ (لە سامناکی ئەو رۆژە و بەهۆی دڵنیاییان لە زانیاری بێ سنووری خوایی) وتیان: ئێمە نازانین و هیچ شارەزاییەکمان نیە، بەراستی خوایە تۆ هەر خۆت ئاگات لە هەموو نهێنی و شاراوەکانە و بە هەموو پەنهانێک دەزانیت.

(١١٠) ئەوسا (لەناو هەموو پێغەمبەراندا روو بە عیسای کوڕی مەریەم) خوا فەرمووی: ئەی عیسای کوڕی مەریەم یادی ئەو نازو نیعمەتەی من بکەرەوە کە رژاندم بەسەر خۆت و دایکدا، کاتێک من بەهۆی فریشتە جوبرەئیلی پیرۆزەوە پشتیوانیم لێکردیت، ئەوکاتەی لە بێشکەداو بەپیریش بەرەوانی قسەت بۆ خەڵکی دەکرد، هەروەها کاتێک فێری نووسین و دانایی و تەورات و ئینجیلم کردیت، کاتێکیش لە قوڕ وەک شێوەی باڵندەت دروست دەکرد بەفەرمانی من، ئەمجا فووت پیادەکرد، جا دەبوو بەباڵندە بەفەرمانی من و کوێری زگماک و بەڵەکت چاک دەکردەوە بەفەرمانی من، کاتێکیش مردووەکانت بەزیندوویی بەفەرمانی من لە گۆڕ دەردەهێنایەوە، هەروەها یادی ئەوە بکەرەوە کە شەڕی نەوەی ئیسرائیلم لێ لادایت، کاتێک بەبەڵگە ئاشکراکانەوە هاتی بۆ لایان، جا ئەوانەشیان کە بێباوەڕ بوون وتیان: ئەمە جگە لەوەی جادوویەکی ئاشکرایە هیچ شتێکی تر نیە.

(١١١) هەروەها کاتێک نیگام نارد بۆ هاوەڵە دڵسۆزو تایبەتیەکانی عیسا (حەواریەکان) کە ئیمان و باوەڕ بهێنن بە من و بە پێغەمبەرەکەم، ئەوانیش وتیان: ئیمان و باوەڕی تەواومان هەیە، خوایە تۆش بەشایەت بە کە بەراستی ئێمە موسڵمان و (ملکەچ و دڵسۆزین).

(١١٢) کاتێک حەواریەکانیش وتیان: ئەی عیسای کوڕی مەریەم، ئایا پەروەردگاری تۆ دەتوانێت لە ئاسمانەوە سفرە و خوانێکمان بۆ دابەزێنێت؟ عیسا وتی: لە خوا بترسن، ئەگەر ئێوە ئیماندارن، (ئەمە چ داخوازیەکە دەیکەن؟).

(١١٣) (حەواریەکان بۆ پاساوی داواکەیان) وتیان: دەمانەوێت (بۆ پیرۆزی و بەرەکەت) لێی بخۆین و دڵنیابین و چاک بزانین کە بێگومان راستت لەگەڵدا کردووین و لەسەریشی ببینە شایەت (تا ئەوەی باوەڕی هەیە باوەڕی دامەزراوتر بێت).

قَالَ عِيسَى ابْنُ مَرْيَمَ اللَّهُمَّ رَبَّنَا أَنزِلْ عَلَيْنَا مَائِدَةً مِّنَ السَّمَاءِ تَكُونُ لَنَا عِيدًا لِّأَوَّلِنَا وَآخِرِنَا وَآيَةً مِّنكَ وَارْزُقْنَا وَأَنتَ خَيْرُ الرَّازِقِينَ ﴿١١٤﴾ قَالَ اللَّهُ إِنِّي مُنَزِّلُهَا عَلَيْكُمْ فَمَن يَكْفُرْ بَعْدُ مِنكُمْ فَإِنِّي أُعَذِّبُهُ عَذَابًا لَّا أُعَذِّبُهُ أَحَدًا مِّنَ الْعَالَمِينَ ﴿١١٥﴾ وَإِذْ قَالَ اللَّهُ يَا عِيسَى ابْنَ مَرْيَمَ أَأَنتَ قُلْتَ لِلنَّاسِ اتَّخِذُونِي وَأُمِّيَ إِلَٰهَيْنِ مِن دُونِ اللَّهِ قَالَ سُبْحَانَكَ مَا يَكُونُ لِي أَنْ أَقُولَ مَا لَيْسَ لِي بِحَقٍّ إِن كُنتُ قُلْتُهُ فَقَدْ عَلِمْتَهُ تَعْلَمُ مَا فِي نَفْسِي وَلَا أَعْلَمُ مَا فِي نَفْسِكَ إِنَّكَ أَنتَ عَلَّامُ الْغُيُوبِ ﴿١١٦﴾ مَا قُلْتُ لَهُمْ إِلَّا مَا أَمَرْتَنِي بِهِ أَنِ اعْبُدُوا اللَّهَ رَبِّي وَرَبَّكُمْ وَكُنتُ عَلَيْهِمْ شَهِيدًا مَّا دُمْتُ فِيهِمْ فَلَمَّا تَوَفَّيْتَنِي كُنتَ أَنتَ الرَّقِيبَ عَلَيْهِمْ وَأَنتَ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ شَهِيدٌ ﴿١١٧﴾ إِن تُعَذِّبْهُمْ فَإِنَّهُمْ عِبَادُكَ وَإِن تَغْفِرْ لَهُمْ فَإِنَّكَ أَنتَ الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ ﴿١١٨﴾ قَالَ اللَّهُ هَٰذَا يَوْمُ يَنفَعُ الصَّادِقِينَ صِدْقُهُمْ لَهُمْ جَنَّاتٌ تَجْرِي مِن تَحْتِهَا الْأَنْهَارُ خَالِدِينَ فِيهَا أَبَدًا رَّضِيَ اللَّهُ عَنْهُمْ وَرَضُوا عَنْهُ ذَٰلِكَ الْفَوْزُ الْعَظِيمُ ﴿١١٩﴾ لِلَّهِ مُلْكُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَمَا فِيهِنَّ وَهُوَ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ ﴿١٢٠﴾

(١١٤) ئەوسا عیسای کوڕی مەریەم وتی: ئەی خوای پەروەردگار لە ئاسمانەوە سفرە و خوانێکمان بۆ دابەزێنە تا ببێتە جەژن بۆ نەوەکانی ئێستا و داهاتوومان و بەڵگەیەک بێت لەلایەن تۆوە بۆ پێغەمبەرایەتی من و دەسەڵاتی بێ سنوورت و لە رزق و رۆزی بەهرەوەرمان بکە، هەر تۆی چاکترین رۆزی بەخش.

(١١٥) (ئینجا) خوا فەرمووی: بەڕاستی من ئەو سفرە و خوانەتان بۆ دادەبەزێنم، جا ئەوەتان (دوای دابەزاندنی سفرەوخوانەکە) بێ بڕوابێت و سوپاس ناپەزێربێت، ئەوە بەڕاستی من سزایەکی دەدەم کە سزای هیچ کەسێکم لە جیهاندا ئاوا نەدا بێت.

(١١٦) کاتێکیش خوا (هەر لە قیامەتدا) فەرمووی: ئەی عیسای کوڕی مەریەم، ئایا ئەوە تۆ بەخەڵکیت وتوە: منیش و دایکیشم بە دوو خوا دابنێن لە خوار خوای پەروەردگارەوە؟ عیسا لە وەڵامدا وتی: پاکی و بێگەردی و بێ هاوەڵی شایستەی تۆیە، بۆم نیە من شتێک بڵێم بۆ خۆم کە مافی من نەبێت؟! (چۆن حەق بەخۆم دەدەم شتی وا بێت بە زارمدا؟!) خۆ ئەگەر شتی وام وتبێت ئەوە بەڕاستی تۆ دەیزانیت و لێت شاراوە نیە، چونکە تۆ دەزانیت بەهەرچی لە دڵ و دەروونمدا هەیە، بەڵام من نازانم بەوەی کە لە دەریای علم و زانستی بێ پایانی تۆدا هەیە، چونکە بەڕاستی هەر تۆ زانا و شارەزای نهێنی و پەنهانی.

(١١٧) (بێگومان تۆ چاک دەزانیت): من هیچ شتێکم پێ نەوتوون جگە لەوەی کە تۆ فەرمانت پێداوم، ئەویش ئەوەیە: تەنها خوا بپەرستن کە پەروەردگاری من و پەروەردگاری ئێوەشە و من شایەت بووم بەسەریانەوە هەتا لەناویاندا بووم، ئینجا کاتێک منت مراند و گیانت کێشام، ئیتر ئەوە هەر خۆت چاودێر و ئاگادار بوویت لێیان و هەر تۆش شایەتیت بەسەر هەموو شتێکەوە.

(١١٨) جا ئەگەر ئەشکەنجەیان بدەیت (لەسەر لادان و تاوانیان)، ئەوە بەڕاستی بەندەی خۆتن و ئەگەر لێشیان خۆش ببیت، ئەوە بەڕاستی تۆ خۆت خوایەکی باڵادەست و دانایت (دەزانیت کێ شایستەی لێخۆشبوونە).

(١١٩) (ئینجا) خوای گەورە فەرمووی: ئەمە ئەو رۆژەیە کە راستگۆیان راستگۆییەکەیان سوودیان پێدەگەیەنێت، باخەکانی بەهەشت بۆیان ئامادەیە کە چەندەها رووبار بەژێر درەختەکانیدا دەڕوات و بۆ هەمیشە و هەتاهەتایی لەو بەهەشتەدا دەمێننەوە و خوای پەروەردگاریش لێیان رازی بووە و ئەوانیش لە خوا رازی بوون، ئەوەیە سەرفرازیی گەورە و بێ‌سنوور.

(١٢٠) ئاسمانەکان و زەوی هەر خوا خاوەنیانە، هەروەها ئەوەش کە تیایاندایە و ئەو زاتە هەمیشە دەسەڵاتی بەسەر هەموو شتێکدا هەیە.

سُورَةُ الأَنعَام

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ وَجَعَلَ ٱلظُّلُمَٰتِ وَٱلنُّورَ ثُمَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ بِرَبِّهِمْ يَعْدِلُونَ ﴿١﴾ هُوَ ٱلَّذِى خَلَقَكُم مِّن طِينٍ ثُمَّ قَضَىٰٓ أَجَلًا وَأَجَلٌ مُّسَمًّى عِندَهُۥ ثُمَّ أَنتُمْ تَمْتَرُونَ ﴿٢﴾ وَهُوَ ٱللَّهُ فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَفِى ٱلْأَرْضِ يَعْلَمُ سِرَّكُمْ وَجَهْرَكُمْ وَيَعْلَمُ مَا تَكْسِبُونَ ﴿٣﴾ وَمَا تَأْتِيهِم مِّنْ ءَايَةٍ مِّنْ ءَايَٰتِ رَبِّهِمْ إِلَّا كَانُوا۟ عَنْهَا مُعْرِضِينَ ﴿٤﴾ فَقَدْ كَذَّبُوا۟ بِٱلْحَقِّ لَمَّا جَآءَهُمْ فَسَوْفَ يَأْتِيهِمْ أَنۢبَٰٓؤُا۟ مَا كَانُوا۟ بِهِۦ يَسْتَهْزِءُونَ ﴿٥﴾ أَلَمْ يَرَوْا۟ كَمْ أَهْلَكْنَا مِن قَبْلِهِم مِّن قَرْنٍ مَّكَّنَّٰهُمْ فِى ٱلْأَرْضِ مَا لَمْ نُمَكِّن لَّكُمْ وَأَرْسَلْنَا ٱلسَّمَآءَ عَلَيْهِم مِّدْرَارًا وَجَعَلْنَا ٱلْأَنْهَٰرَ تَجْرِى مِن تَحْتِهِمْ فَأَهْلَكْنَٰهُم بِذُنُوبِهِمْ وَأَنشَأْنَا مِنۢ بَعْدِهِمْ قَرْنًا ءَاخَرِينَ ﴿٦﴾ وَلَوْ نَزَّلْنَا عَلَيْكَ كِتَٰبًا فِى قِرْطَاسٍ فَلَمَسُوهُ بِأَيْدِيهِمْ لَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓا۟ إِنْ هَٰذَآ إِلَّا سِحْرٌ مُّبِينٌ ﴿٧﴾ وَقَالُوا۟ لَوْلَآ أُنزِلَ عَلَيْهِ مَلَكٌ وَلَوْ أَنزَلْنَا مَلَكًا لَّقُضِىَ ٱلْأَمْرُ ثُمَّ لَا يُنظَرُونَ ﴿٨﴾

**سوورەتی (الأنعام)**

**بەناوی خوای بەخشندە و میهرەبان**

(١) سوپاس و ستایش بۆ ئەو خوایەی کە ئاسمانەکان و زەوی دروست کردووە، تاریکی و روناکی فەراهەم هێناوە (کەچی لەگەڵ ئەو هەموو بەڵگە بەهێزو سەرسام ئاوەرانەدا) پاشان ئەوانەی بێ باوەڕ بوون بەپەروەردگاریان یەکێک لە دروستکراوەکانی خوا دەکەنە هاوتای خوا.

(٢) خوا ئەو زاتەیە کە ئێوەی لە قوڕێک دروست کردووە لەوەودوا کاتێکی بڕیاریدا (کە خەوتنە وەک نیوە مەرگێک، بەشێک لەئەندامە هەستیارەکان لەکار دەکەون بۆ ماوەیەک) و کاتێکی دیاریکراوی تریشی لای خۆی بڕیارداوە بۆ هەموو کەسێک کە کاتی تەواو بوونی تەمەنیەتی، (کەچی پاش ئەو هەموو بەڵگانە بۆ دەسەڵاتی بێ سنووری خوا) ئێوە ئینکاری زیندوو بوونەوە دەکەن و هەر لە گوماندان!!

(٣) ئەوە هەر ﷲ یە پەرستراوە لە ئاسمانەکان و زەویدا و نهێنی و ئاشکراتان دەزانێت، بە هەموو کارو کردەوەیەکیش کەدەیکەن ئاگادارە.

(٤) (بێ باوەڕان) هیچ بەڵگەو موعجیزەیەکی پەروەردگاریان بۆ نایەت پشتی تێنەکەن و رووی لێ وەرنەگێڕن.

(٥) کەوابوو بێگومان ئەوانە کاتێک ئەو حەق و راستیەیان بۆ هات کە قورئانە بڕوایان پێنەکرد، جا لە ئایندەدا بۆیان دێت و پێیان دەگات هەواڵی ئەوەی کە ئەوان گاڵتەیان پێدەکرد.

(٦) ئایا نەیانبینیوە و نەیانزانیووە (بەهۆی شوێنەوارەوە) چەندەها نەوەمان پێش ئەمان لەناو بردووە کە پایەدارمان کردبوون لە زەویدا، بەشێوەیەک ئێوەمان ئاوا پایەدار نەکردووە و بارانی زۆرمان بەردەوام بۆ دەباراندن (کە دەبووە هۆی پێگەیشتنی جۆرەها رووەک و بەروبووم)، چەندەها جۆگەو رووباریشمان لەناو کێڵگەو باخ و شارەکانیاندا بۆ رەخساندبوون خوڕەمی دەکرد بەنێو درەخت و کۆشک و تەلاریاندا، بەڵام بەهۆی لادان و گوناهو تاوانیانەوە لەناومان بردن و نەوەی ترمان لە دوای ئەوان هێنایە کایەوە.

(٧) خۆ ئەگەر نووسراوێکمان بۆ تۆ لەناو کاغەزێکدا دابەزاندایە، ئەوجا دەستیشیان لێ بدایە، ئەوە ئەوانەی کە بێ بڕوا بوون دەیانوت: ئەمە جگە لە جادوویەکی ئاشکرا هیچ شتێکی تر نیە!! (هەر باوەڕ ناهێنن).

(٨) هەروەها دەیانوت: چی دەبوو ئەگەر فریشتەیەک بۆ لای (محمدﷺ) دابەزیایە و بەچاوی خۆمان بمانبینیایە! جا ئەگەر فریشتەمان بناردایە ئەوە کۆتایی بەهەموو شتێک دەهات و پاشان مۆڵەت نادرێن تا تەوبە بکەن.

وَلَوْ جَعَلْنَٰهُ مَلَكًا لَّجَعَلْنَٰهُ رَجُلًا وَلَلَبَسْنَا عَلَيْهِم مَّا يَلْبِسُونَ ﴿٩﴾ وَلَقَدِ ٱسْتُهْزِئَ بِرُسُلٍ مِّن قَبْلِكَ فَحَاقَ بِٱلَّذِينَ سَخِرُوا۟ مِنْهُم مَّا كَانُوا۟ بِهِۦ يَسْتَهْزِءُونَ ﴿١٠﴾ قُلْ سِيرُوا۟ فِى ٱلْأَرْضِ ثُمَّ ٱنظُرُوا۟ كَيْفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلْمُكَذِّبِينَ ﴿١١﴾ قُل لِّمَن مَّا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۖ قُل لِّلَّهِ ۚ كَتَبَ عَلَىٰ نَفْسِهِ ٱلرَّحْمَةَ ۚ لَيَجْمَعَنَّكُمْ إِلَىٰ يَوْمِ ٱلْقِيَٰمَةِ لَا رَيْبَ فِيهِ ۚ ٱلَّذِينَ خَسِرُوٓا۟ أَنفُسَهُمْ فَهُمْ لَا يُؤْمِنُونَ ﴿١٢﴾ ۞ وَلَهُۥ مَا سَكَنَ فِى ٱلَّيْلِ وَٱلنَّهَارِ ۚ وَهُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْعَلِيمُ ﴿١٣﴾ قُلْ أَغَيْرَ ٱللَّهِ أَتَّخِذُ وَلِيًّا فَاطِرِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَهُوَ يُطْعِمُ وَلَا يُطْعَمُ ۗ قُلْ إِنِّىٓ أُمِرْتُ أَنْ أَكُونَ أَوَّلَ مَنْ أَسْلَمَ ۖ وَلَا تَكُونَنَّ مِنَ ٱلْمُشْرِكِينَ ﴿١٤﴾ قُلْ إِنِّىٓ أَخَافُ إِنْ عَصَيْتُ رَبِّى عَذَابَ يَوْمٍ عَظِيمٍ ﴿١٥﴾ مَّن يُصْرَفْ عَنْهُ يَوْمَئِذٍ فَقَدْ رَحِمَهُۥ ۚ وَذَٰلِكَ ٱلْفَوْزُ ٱلْمُبِينُ ﴿١٦﴾ وَإِن يَمْسَسْكَ ٱللَّهُ بِضُرٍّ فَلَا كَاشِفَ لَهُۥٓ إِلَّا هُوَ ۖ وَإِن يَمْسَسْكَ بِخَيْرٍ فَهُوَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ ﴿١٧﴾ وَهُوَ ٱلْقَاهِرُ فَوْقَ عِبَادِهِۦ ۚ وَهُوَ ٱلْحَكِيمُ ٱلْخَبِيرُ ﴿١٨﴾



(٩) خۆ ئەگەر فریشتەمان بکردایە بە فرستادە، ئەوە لە شێوەی پیاوێکدا دەماننارد و هەمان گومان کە ئێستا هەیانە بۆیان دروست دەبوو.

(١٠) (ئەی محمد ﷺ دڵت لەخۆت دانەمێنێت) سوێندبێت بەخوا بەڕاستی گاڵتەکراوە بە پێغەمبەرانی پێش تۆ، سەرەنجام ئەوەی ئەوان بڕوایان پێی نەبوو، گاڵتەیان پێدەکرد، یەخەی پێگرتن و نغرۆی کردن (خوا تۆڵەی لێسەندن).

(١١) پێیان بڵێ: بڕۆن بگەڕێن بەسەر زەویدا و پاشان تەماشا بکەن و سەرنج بدەن، بزانن سەر ئەنجامی ئەوانەی بەرنامەی خوایان بەدرۆزانی چۆن بووە (چیمان بەسەرهێنان).

(١٢) (لێیان بپرسە ئەی محمد ﷺ) و بڵێ: ئەوەی لە ئاسمانەکان و زەویدا هەیە هی کێیە؟ (هەر خۆت وەڵام بدەرەوە و) بڵێ: هەر هی خوایە، کە ڕەحم و میهرەبانی لەسەرخۆی فەرز کردووە، سوێند بێت بەخوا بەرەو ڕۆژی قیامەت کە هیچ شکوگومانی تیادا نیە کۆتان دەکاتەوە، (هەرچەندە) ئەوانەی کە خۆیان دۆڕاندو بیریان لە قیامەت نەکردەوە، ئەوە هەر باوەڕ ناهێنن.

(١٣) هەرچی کش و مات بووە لە شەودا و دەجولێت لە ڕۆژدا هەر هی خوایە، بێگومان ئەو پەروەردگارە خوایەکی بیسەرو زانایە.

(١٤) هەروەها پێیان بڵێ: ئایا (بەعەقڵ و ژیریی ئێوە ڕەوایە) کە جگە لە خوا کەسێکی تر بکەمە پشت و پەنای خۆم؟ کە بەدیهێنەری ئاسمانەکان و زەویە و هەر ئەویش ڕۆزی بەخشە و بێ نیازە لە هەموو رزق و ڕۆزیەک، دووبارە بڵێ: من بەڕاستی فەرمانم پێدراوە یەکەم کەس بم کە تەسلیمی ئەو زاتە ببم و موسوڵمان بم و (من پێت ڕادەگەیەنم) کە: هەرگیز نەکەیت لە موشریک و هاوەڵگەران بیت.

(١٥) (هەروەها ئەی محمد ﷺ) بڵێ: بەڕاستی من زۆر لە سزای ڕۆژێکی گەورە دەترسم کە سزای ڕۆژی قیامەتە ئەگەر یاخی بم لە فەرمانی پەروەردگارم.

(١٦) ئەوەی لەو سزایە دەرباز بکرێت لەو ڕۆژەدا، ئەوە بەڕاستی ئیتر دیارە کە خوا ڕەحمی پێکردووە و شایستەی میهرەبانی ئەو بووە، ئەو دەرباز بوونە سەرفرازیەکی ئاشکرایە.

(١٧) (دڵنیابە لەوەی) ئەگەر خوا دووچاری زیان و گرفتێکت بکات، ئەوە هەرگیز لابەری نیە جگە خۆی نەبێت، خۆ ئەگەر بیەوێت تووشی خێرو خۆشیەکت بکات، ئەوە ئەو خوایە دەسەڵاتی بەسەر هەموو شتێکدا هەیە.

(١٨) هەر ئەو خوایەش زاڵ و باڵادەستە بەسەر هەموو بەندەکانیدا و هەر ئەویشە زاتێکی دانا و ئاگایە (بەنهێنی و ئاشکرای بەندەکانی).

قُلْ أَيُّ شَيْءٍ أَكْبَرُ شَهَادَةً قُلِ اللَّهُ شَهِيدٌ بَيْنِي وَبَيْنَكُمْ وَأُوحِيَ إِلَيَّ هَٰذَا الْقُرْآنُ لِأُنذِرَكُم بِهِ وَمَن بَلَغَ أَئِنَّكُمْ لَتَشْهَدُونَ أَنَّ مَعَ اللَّهِ آلِهَةً أُخْرَىٰ قُل لَّا أَشْهَدُ قُلْ إِنَّمَا هُوَ إِلَٰهٌ وَاحِدٌ وَإِنَّنِي بَرِيءٌ مِّمَّا تُشْرِكُونَ ﴿١٩﴾ الَّذِينَ آتَيْنَاهُمُ الْكِتَابَ يَعْرِفُونَهُ كَمَا يَعْرِفُونَ أَبْنَاءَهُمُ الَّذِينَ خَسِرُوا أَنفُسَهُمْ فَهُمْ لَا يُؤْمِنُونَ ﴿٢٠﴾ وَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّنِ افْتَرَىٰ عَلَى اللَّهِ كَذِبًا أَوْ كَذَّبَ بِآيَاتِهِ إِنَّهُ لَا يُفْلِحُ الظَّالِمُونَ ﴿٢١﴾ وَيَوْمَ نَحْشُرُهُمْ جَمِيعًا ثُمَّ نَقُولُ لِلَّذِينَ أَشْرَكُوا أَيْنَ شُرَكَاؤُكُمُ الَّذِينَ كُنتُمْ تَزْعُمُونَ ﴿٢٢﴾ ثُمَّ لَمْ تَكُن فِتْنَتُهُمْ إِلَّا أَن قَالُوا وَاللَّهِ رَبِّنَا مَا كُنَّا مُشْرِكِينَ ﴿٢٣﴾ انظُرْ كَيْفَ كَذَبُوا عَلَىٰ أَنفُسِهِمْ وَضَلَّ عَنْهُم مَّا كَانُوا يَفْتَرُونَ ﴿٢٤﴾ وَمِنْهُم مَّن يَسْتَمِعُ إِلَيْكَ وَجَعَلْنَا عَلَىٰ قُلُوبِهِمْ أَكِنَّةً أَن يَفْقَهُوهُ وَفِي آذَانِهِمْ وَقْرًا وَإِن يَرَوْا كُلَّ آيَةٍ لَّا يُؤْمِنُوا بِهَا حَتَّىٰ إِذَا جَاءُوكَ يُجَادِلُونَكَ يَقُولُ الَّذِينَ كَفَرُوا إِنْ هَٰذَا إِلَّا أَسَاطِيرُ الْأَوَّلِينَ ﴿٢٥﴾ وَهُمْ يَنْهَوْنَ عَنْهُ وَيَنْأَوْنَ عَنْهُ وَإِن يُهْلِكُونَ إِلَّا أَنفُسَهُمْ وَمَا يَشْعُرُونَ ﴿٢٦﴾ وَلَوْ تَرَىٰ إِذْ وُقِفُوا عَلَى النَّارِ فَقَالُوا يَا لَيْتَنَا نُرَدُّ وَلَا نُكَذِّبَ بِآيَاتِ رَبِّنَا وَنَكُونَ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ ﴿٢٧﴾

(١٩) (ئەی پێغەمبەر ﷺ بەوانە بڵێ کە شایەتیان دەوێت لەسەر پێغەمبەرایەتی تۆ) چ شتێک گەورەترو راسترە لە شایەتیدا ؟! هەرخۆت بڵێ: الله راسترین شایەتە، کە شایەتی نێوان من و ئێوەیە، من ئەم قورئانەشم بەوەحی و نیگا بۆ هاتووە تا ئێوەو هەموو ئەوانەی پێیان گەیشتووە ئاگادارو بێدار بکەم،(لەگەڵ ئەم هەموو روون کردنەوانەدا) ئایا ئێوە ئیتر شایەتی دەدەن کە بەراستی لەگەڵ خوادا چەند خوایەکی تر هەبێت؟! بڵێ: (من بەش بەحاڵی خۆم) شایەتی ناحەق و نارەوای وا نادەم و بڵێ: بەراستی ئەو خوایە زاتێکی تاک و تەنهایە و من بەڕاستی بەریم لە هەموو ئەو شتانەی کە ئێوە دەیانکەنە هاوەڵ وهاوتای ئەو زاتە).

(٢٠) ئەوانەی کتێبی (ئاسمانیمان پێداون لە گاورو جوو) پێغەمبەر ﷺ دەناسنەوە هەروەک چۆن منداڵەکانی خۆیان دەناسنەوە، (بەڵام) ئەوانەی کە خۆیان دۆڕاندو بڕوایان بەمحمد ﷺ نەهێناوە، ئەوە هەر باوەڕ ناهێنن.

(٢١) جا کێ هەیە لەوە ستەمکارتر بێت، کە شتی نادروست و درۆ، بۆ خوا هەڵدەبەستێت؟ یان ئایەت و فەرمانەکانی خوا بەدرۆ دەزانێت؟! چونکە بەڕاستی ئەو ستەمکارنە سەرفراز نابن.

(٢٢) لە رۆژێکدا کە هەموو (خوانەناس و) هاوەڵگەران کۆ دەکەینەوە بەگشتی و پاشان دەڵێین بەوانەی کە هاوبەشیان داناوە بۆ خوا: کوان و لە کوێن ئەو شتانەی دەتانپەرستن و دەتانوت هاوتای خوان بەخەیاڵی خۆتان؟!

(٢٣) پاشان سەرەنجامی بێ باوەڕیان هیچ نەبوو بێجگە لەوەی کە وتیان: سوێند بەخوای پەروەردگارمان ئێمە هەرگیز موشریک و هاوەڵگەر نەبووین!!

(٢٤) سەیرکە چۆن درۆ لەگەڵ خۆشیان دەکەن، چۆن بیروبڕوای پووچیان لێ ون بووە و ئاسەواری نەماوە.

(٢٥) هەندێکیش لەو(بێ باوەڕانە) گوێت بۆ دەگرن (لەکاتی خوێندنی قورئاندا، بەڵام چونکە مەبەستیان نیە شوێن حەقیقەت بکەون) ئێمە پەردەمان هێنا بەسەر دڵیاندا لە تێگەیشتنیان بۆ قورئانەکە و گوێمان سەنگین و گران کردوون (وەک ئەوە وایە کە نەبیستن) ئەگەر هەرچی نیشانەو بەڵگەیەکیش هەیە ببینن ئەوان بڕوای پێناکەن، هەتا کاتێکیش کە دێن بۆ لات دەیکەنە موجادەلەو دەمەدەمێ، سەرئەنجام خوانەناسان دەڵێن: ئەم قورئانە هیچ نیە بێجگە لە داستانی پێشینان نەبێت!!

(٢٦) ئەوانە نایەڵن کەس گوێ بۆ قورئان بگرێت و خۆیشیانی لێ دوور دەخەنەوە، (جا بەو کارەیان) جگە خودی خۆیان کەس لەناو نابەن و هەستیشی پێناکەن.

(٢٧) جا ئەگەر ئەوانە ببینی (لە قیامەتدا) لەسەر لێواری دۆزەخ راوەستێنراون (بەدەم حسرەت و ئاهوناڵەوە) جا دەڵێن: خۆزگە جارێکی تر بیانگێڕاینایەتەوە بۆ دنیاو (لەم سەرئەنجامە شوومە رزگارمان دەبوو) ئەوسا هەرگیز نیشانەو بەڵگەو ئایەتەکانی خوامان بەدرۆ نەدەزانی و، باوەڕی بەتینمان پێی دەبوو...

بَلْ بَدَا لَهُم مَّا كَانُوا يُخْفُونَ مِن قَبْلُ ۖ وَلَوْ رُدُّوا لَعَادُوا لِمَا نُهُوا عَنْهُ وَإِنَّهُمْ لَكَاذِبُونَ ﴿٢٨﴾ وَقَالُوا إِنْ هِيَ إِلَّا حَيَاتُنَا الدُّنْيَا وَمَا نَحْنُ بِمَبْعُوثِينَ ﴿٢٩﴾ وَلَوْ تَرَىٰ إِذْ وُقِفُوا عَلَىٰ رَبِّهِمْ ۚ قَالَ أَلَيْسَ هَٰذَا بِالْحَقِّ ۚ قَالُوا بَلَىٰ وَرَبِّنَا ۚ قَالَ فَذُوقُوا الْعَذَابَ بِمَا كُنتُمْ تَكْفُرُونَ ﴿٣٠﴾ قَدْ خَسِرَ الَّذِينَ كَذَّبُوا بِلِقَاءِ اللَّهِ ۖ حَتَّىٰ إِذَا جَاءَتْهُمُ السَّاعَةُ بَغْتَةً قَالُوا يَا حَسْرَتَنَا عَلَىٰ مَا فَرَّطْنَا فِيهَا وَهُمْ يَحْمِلُونَ أَوْزَارَهُمْ عَلَىٰ ظُهُورِهِمْ ۚ أَلَا سَاءَ مَا يَزِرُونَ ﴿٣١﴾ وَمَا الْحَيَاةُ الدُّنْيَا إِلَّا لَعِبٌ وَلَهْوٌ ۖ وَلَلدَّارُ الْآخِرَةُ خَيْرٌ لِّلَّذِينَ يَتَّقُونَ ۗ أَفَلَا تَعْقِلُونَ ﴿٣٢﴾ قَدْ نَعْلَمُ إِنَّهُ لَيَحْزُنُكَ الَّذِي يَقُولُونَ ۖ فَإِنَّهُمْ لَا يُكَذِّبُونَكَ وَلَٰكِنَّ الظَّالِمِينَ بِآيَاتِ اللَّهِ يَجْحَدُونَ ﴿٣٣﴾ وَلَقَدْ كُذِّبَتْ رُسُلٌ مِّن قَبْلِكَ فَصَبَرُوا عَلَىٰ مَا كُذِّبُوا وَأُوذُوا حَتَّىٰ أَتَاهُمْ نَصْرُنَا ۚ وَلَا مُبَدِّلَ لِكَلِمَاتِ اللَّهِ ۚ وَلَقَدْ جَاءَكَ مِن نَّبَإِ الْمُرْسَلِينَ ﴿٣٤﴾ وَإِن كَانَ كَبُرَ عَلَيْكَ إِعْرَاضُهُمْ فَإِنِ اسْتَطَعْتَ أَن تَبْتَغِيَ نَفَقًا فِي الْأَرْضِ أَوْ سُلَّمًا فِي السَّمَاءِ فَتَأْتِيَهُم بِآيَةٍ ۚ وَلَوْ شَاءَ اللَّهُ لَجَمَعَهُمْ عَلَى الْهُدَىٰ ۚ فَلَا تَكُونَنَّ مِنَ الْجَاهِلِينَ ﴿٣٥﴾

(٢٨) نەخێر راست ناکەن و بڕواناهێنن، بێگومان ئەوە ئاواتێکی ئەستەمە، هەموو ئەو کاروکردەوە و پیلانانەی کە پێشتر دەیانشاردەوە، ئێستا وا ئاشکرا بووە بۆیان، خۆ ئەگەر بگێردرێنەوە بۆ (دنیا) ئەوە هەر دەست دەکەنەوە بەو کارو کردەوانەی کە جاران دەیانکرد، بەڕاستی ئەوانە هەر درۆ دەکەن و درۆزنن.

(٢٩) ئەوانە وتیان: ژیان هەر ئەم ژیانەی دنیایەو هیچی تر نیە، ئێمە زیندوو ناکرێینەوە (بۆ لێپرسینەوە).

(٣٠) جا ئەگەر کاتێک ئەوانە دەبینیت (لەبەردەم دادگای پڕ لەدادی) پەروەردگاریاندا وەستێنراون، (خوای گەورە پێیان) دەفەرموێت: ئایا ئەمەی (کە بۆتان پێشهاتووەو دەیبینن) راست و حەقیقەت نیە؟ (بەکەساسی و خەجاڵەتیەوە) دەڵێن: بەڵێ راستە، سوێند بە پەروەردگارمان (ئینجا خوا) دەفەرموێت: (مادەم وایە) سزاو تاڵاو بچێژن بەهۆی بێ باوەڕی و یاخی بوونتانەوە.

(٣١) بەڕاستی ئەوانەی کە بڕوایان بەئامادە بوونی بەردەم(دادگای) خوایی نەبوو زەرەریان کرد و خۆیان دۆڕاند، کاتێکیش قیامەت کتوپڕ یەخەیان پێدەگرێت، دەڵێن: ئاخ و داخ وپەشیمانی بۆ ئەو رۆژگارەی بەکەمتەرخەمی و (بەبەرەڵایی و سەرکەشی و تاوان) بردمانەسەر، لەکاتێکدا ئەوانە هەموو گوناهو تاوانیان داوە بەکۆڵیاندا، ئاگاداربن کە چەندە خراپە، کۆڵ و باری وا، کە هەڵی دەگرن.

(٣٢) ژیانی دنیا جگە لە یاری و گەمەو گاڵتەیەکی کەم نەبێت هیچی تر نیە، بێگومان ماڵی دوایی (بەهەشتی بەرین) چاکترە بۆ ئەوانەی کە پارێزکاری و خواناسی دەکەن، ئایا ئەوە عەقڵ و ژیریتان بۆ ناخەنەکار و ژیر نابن؟

(٣٣) بەڕاستی چاک دەزانین کە گوفتاری نادروستی خوانەناسان غەم و پەژارەت بۆ پێش دەهێنێت، چونکە بەڕاستی ئەوانە وەنەبێت تۆ بەدرۆزن بزانن، بەڵکو ستەمکاران هەر داننانێن و ئینکاری ئایەت و فەرمانەکانی خوا دەکەن.

(٣٤) سوێند بێت بێگومان پێغەمبەرانی پێش تۆش بڕوایان پێنەکراوە، لەگەڵ ئەوەشدا ئەوان دانیان بەخۆدا گرت لەسەر ئەو بڕوا پێ نەبوونەیان، ئازارو ئەشکەنجەش دران، هەتا سەرئەنجام سەرکەوتنی ئێمەیان بۆهات و بەهرەوەر بوون پێی و هیچ شتێک نیە بتوانێت ویست و فەرمانەکانی خوا بگۆڕێت، سوێند بێت بەخوا بێگومان هەواڵ و دەنگوباسی هەندێک لە پێغەمبەرانت بۆ هاتووە.

(٣٥) خۆ ئەگەر پشت هەڵکردن و سەرپێچی خوانەناسانت زۆر لاسەختە، جا ئەگەر دەتوانیت تونێلێک لە زەویدا هەڵبکەنیت یان پەیژەیەک بەئاسماندا هەڵپەسێریت تا موعجیزەیەکیان بۆ پێش بهێنیت (بێسوودە ئەوانە هەر باوەڕ پێناکەن) ئەگەر خواش بیویستایە لەسەر هیدایەت و رێبازی دروست، ئەوە کۆی دەکردنەوە (بەمەرجێک خۆیان مەبەستیان بێت)، کەواتە لەو کەسانە مەبە کە شارەزانین.



﴿ إِنَّمَا يَسْتَجِيبُ الَّذِينَ يَسْمَعُونَ وَالْمَوْتَىٰ يَبْعَثُهُمُ اللَّهُ ثُمَّ إِلَيْهِ يُرْجَعُونَ ﴿٣٦﴾ وَقَالُوا لَوْلَا نُزِّلَ عَلَيْهِ آيَةٌ مِّن رَّبِّهِ قُلْ إِنَّ اللَّهَ قَادِرٌ عَلَىٰ أَن يُنَزِّلَ آيَةً وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَهُمْ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٣٧﴾ وَمَا مِن دَابَّةٍ فِي الْأَرْضِ وَلَا طَائِرٍ يَطِيرُ بِجَنَاحَيْهِ إِلَّا أُمَمٌ أَمْثَالُكُم مَّا فَرَّطْنَا فِي الْكِتَابِ مِن شَيْءٍ ثُمَّ إِلَىٰ رَبِّهِمْ يُحْشَرُونَ ﴿٣٨﴾ وَالَّذِينَ كَذَّبُوا بِآيَاتِنَا صُمٌّ وَبُكْمٌ فِي الظُّلُمَاتِ مَن يَشَإِ اللَّهُ يُضْلِلْهُ وَمَن يَشَأْ يَجْعَلْهُ عَلَىٰ صِرَاطٍ مُّسْتَقِيمٍ ﴿٣٩﴾ قُلْ أَرَأَيْتَكُمْ إِنْ أَتَاكُمْ عَذَابُ اللَّهِ أَوْ أَتَتْكُمُ السَّاعَةُ أَغَيْرَ اللَّهِ تَدْعُونَ إِن كُنتُمْ صَادِقِينَ ﴿٤٠﴾ بَلْ إِيَّاهُ تَدْعُونَ فَيَكْشِفُ مَا تَدْعُونَ إِلَيْهِ إِن شَاءَ وَتَنسَوْنَ مَا تُشْرِكُونَ ﴿٤١﴾ وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا إِلَىٰ أُمَمٍ مِّن قَبْلِكَ فَأَخَذْنَاهُم بِالْبَأْسَاءِ وَالضَّرَّاءِ لَعَلَّهُمْ يَتَضَرَّعُونَ ﴿٤٢﴾ فَلَوْلَا إِذْ جَاءَهُم بَأْسُنَا تَضَرَّعُوا وَلَٰكِن قَسَتْ قُلُوبُهُمْ وَزَيَّنَ لَهُمُ الشَّيْطَانُ مَا كَانُوا يَعْمَلُونَ ﴿٤٣﴾ فَلَمَّا نَسُوا مَا ذُكِّرُوا بِهِ فَتَحْنَا عَلَيْهِمْ أَبْوَابَ كُلِّ شَيْءٍ حَتَّىٰ إِذَا فَرِحُوا بِمَا أُوتُوا أَخَذْنَاهُم بَغْتَةً فَإِذَا هُم مُّبْلِسُونَ ﴿٤٤﴾

(٣٦) بەڕاستی تەنها ئەوانە بەدەم بانگەوازی خواوە دەچن کە دەبیستن، (دڵ) مردووەکانیش (لە رۆژی قیامەتدا) خوا زیندوویان دەکاتەوە، لەوەودواش بەناچاریی هەر دەبێت بۆ لای ئەو بگەڕێنەوە (تا بەسزای بێباوەڕیی خۆیانیان بگەیەنێت).

(٣٧) (ئەو خوانەناسانە) وتیان: ئەوە بۆ محمد ﷺ موعجیزەیەکی لەلایەن پەروەردگاریەوە بۆ نایەتە خوارەوە؟ بڵێ: بەڕاستی خوا دەسەڵاتی هەیە کە موعجیزە بنێرێت، بەڵام زۆربەی ئەوانە نافامن و نازانن.

(٣٨) هیچ زیندەوەرو گیانلەبەرێک نیە بەسەر زەویدا بڕوات و هیچ باڵندەیەک بەباڵەکانی بفڕێت و ئەوانیش ئوممەت و گەلێک نەبن وەک ئێوە (دڵنیا بن) هیچ شتێک نیە پشت گوێمان خستبێت لە کتێبە (تایبەتیەکەی لوح المحفوظ) دا لەوەودوا هەرهەموو ئەوانە کۆدەکرێنەوە بۆلایپەروەردگاریان (بۆ ئەوەی دادگایی بکرێن و هەموو کەس مافی خۆی وەربگرێت، یان تۆڵەی رەوای لێ بسەنرێت).

(٣٩) ئەوانەی کە بڕوایان نەکردووە بەئایەت و فەرمانەکانی ئێمە، کەڕن حەق نابیستن و لاڵن حەق ناڵێن لەناو تاریکیەکاندا ژیان دەبەنەسەر، بێگومان ئەوەی خوا بیەوێت گومڕای دەکات (چونکە خۆیشی دەستپێشخەرە لەو بوارەدا) و ئەوەش کە بیەوێت (هیدایەتی بداو هیدایەت وەربگرێت) دەیخاتە سەر ڕێبازی ڕاست و ڕەوان.

(٤٠) (بە خوانەناسان) بڵێ: هەواڵم بدەنێ ئەگەر سزاو تۆڵەی خوا یەختان پێبگرێت، یان قیامەت یەختان پێ بگرێت، (ئا لەو کاتانەدا) هاناو هاوار بۆ کەسێک دەبەن جگە لە خوا؟ ئەگەر ئێوە ڕاستگۆن کە غەیری خوا فریاتان دەکەوێت؟!

(٤١) (نەخێر لەوکاتە سامناکانەدا) هەر هاناو هاوار بۆ ئەو زاتە دەبەن (ئەویش خوایەکی میهرەبانە) بەڵاو ناخۆشیەکانتان لەسەر لادەبات ئەگەر بیەوێت، جا لەوکاتەدا هەر شتێک کە بە هاوەڵ و شەریکی ئەو زاتەی دادەنێن، فەرامۆشی دەکەن.

(٤٢) سوێند بێت بێگومان ئێمە پێش تۆ پێغەمبەرانی زۆرمان ڕەوانە کردووە بۆ سەر قەوم وگەلانی تر (جا کاتێک سەرکەش و یاخی بوون)، تووشی تاڵاوی جەنگ و بەڵاو تەنگانەمان کردن بۆ ئەوەی لێمان بپاڕێنەوەو بلاڵێنەوە.

(٤٣) ئەوانە کاتێک تۆڵەو سزای ئێمەیان بۆ هات، بۆ نزاو پاڕانەوەی بەکوڵیان نەکرد، بەڵام دڵیان ڕەق و ڕەش بوو، شەیتانیش ئەو کاروکردەوە ناپەسەندانەی بۆ ڕازاندبوونەوە کە دەیانکرد.

(٤٤) ئینجا کاتێک ئەو بەرنامە و ڕێبازەی کە یادیان خرابۆوە فەرامۆشیان کرد، ئێمەش دەروازەکانی هەموو شتێکمان بۆ واڵا کردنەوە و (نازو نیعمەتمان بەسەردا ڕژاندن) هەتا کاتێک دڵخۆش و شادمان بوون بەوەی کە پێیان درا، ئیتر لەناکاو گرتمانن و هەموویانمان سەرگەردان و ڕیسواکرد ئینجا ئەوان بێ ئومێد بوون و بە غەم و پەژارەیەکی زۆرەوە تیاچوون.

فَقُطِعَ دَابِرُ ٱلْقَوْمِ ٱلَّذِينَ ظَلَمُوا۟ ۚ وَٱلْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٤٥﴾
قُلْ أَرَءَيْتُمْ إِنْ أَخَذَ ٱللَّهُ سَمْعَكُمْ وَأَبْصَٰرَكُمْ وَخَتَمَ عَلَىٰ قُلُوبِكُم
مَّنْ إِلَٰهٌ غَيْرُ ٱللَّهِ يَأْتِيكُم بِهِ ۗ ٱنظُرْ كَيْفَ نُصَرِّفُ ٱلْءَايَٰتِ
ثُمَّ هُمْ يَصْدِفُونَ ﴿٤٦﴾ قُلْ أَرَءَيْتَكُمْ إِنْ أَتَىٰكُمْ عَذَابُ ٱللَّهِ
بَغْتَةً أَوْ جَهْرَةً هَلْ يُهْلَكُ إِلَّا ٱلْقَوْمُ ٱلظَّٰلِمُونَ ﴿٤٧﴾ وَمَا
نُرْسِلُ ٱلْمُرْسَلِينَ إِلَّا مُبَشِّرِينَ وَمُنذِرِينَ ۖ فَمَنْ ءَامَنَ وَأَصْلَحَ
فَلَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ ﴿٤٨﴾ وَٱلَّذِينَ كَذَّبُوا۟ بِـَٔايَٰتِنَا
يَمَسُّهُمُ ٱلْعَذَابُ بِمَا كَانُوا۟ يَفْسُقُونَ ﴿٤٩﴾ قُل لَّآ أَقُولُ لَكُمْ
عِندِى خَزَآئِنُ ٱللَّهِ وَلَآ أَعْلَمُ ٱلْغَيْبَ وَلَآ أَقُولُ لَكُمْ إِنِّى مَلَكٌ ۖ
إِنْ أَتَّبِعُ إِلَّا مَا يُوحَىٰٓ إِلَىَّ ۚ قُلْ هَلْ يَسْتَوِى ٱلْأَعْمَىٰ وَٱلْبَصِيرُ ۚ
أَفَلَا تَتَفَكَّرُونَ ﴿٥٠﴾ وَأَنذِرْ بِهِ ٱلَّذِينَ يَخَافُونَ أَن يُحْشَرُوٓا۟
إِلَىٰ رَبِّهِمْ ۙ لَيْسَ لَهُم مِّن دُونِهِۦ وَلِىٌّ وَلَا شَفِيعٌ لَّعَلَّهُمْ يَتَّقُونَ
﴿٥١﴾ وَلَا تَطْرُدِ ٱلَّذِينَ يَدْعُونَ رَبَّهُم بِٱلْغَدَوٰةِ وَٱلْعَشِىِّ يُرِيدُونَ
وَجْهَهُۥ ۖ مَا عَلَيْكَ مِنْ حِسَابِهِم مِّن شَىْءٍ وَمَا مِنْ حِسَابِكَ
عَلَيْهِم مِّن شَىْءٍ فَتَطْرُدَهُمْ فَتَكُونَ مِنَ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٥٢﴾

(٤٥) ئینجا ئیتر ئەو گەلـەی ستەمیـان کرد و بێ بڕوا بـوون بنبڕ کـران، (جا ئەوکاتـە بوونـەوەر هـاوڕێ لـەگـەڵ ئیمـانداران و فریشتـەکاندا دەڵێـن: الحمد لله رب العالمین).

(٤٦) (ئـەی محمـد ﷺ بـەو بێباوەڕانـە) بڵـێ: هەواڵم بدەنێ ئەگەر خوا دەزگای بیستن و بینینتان لێ وەربگرێتەوە و مۆر بنێت بەسـەر دڵـەکانتاندا، ئایا خوایەک هەیە جگە لـە الله ئـەو دەزگایانـەتان بۆ بهێنێتـەوە؟ سـەیر بکـە و سـەرنج بـدە چـۆن چەندەها نـموونە و بەڵگەیان بۆ دەهێنینەوە، پاشان ئەوان هەر ملەجەڕێ دەکەن و روو وەردەگێرن.

(٤٧) پێیـان بڵـێ: هەواڵـم بـدەنێ، ئەگـەر سزاو تۆڵەی خوا کتوپڕ بـێ پێشەکی یەخـەی پێگرتـن، یـان بـە ئاشکرا نیشانەکـانی دەرکـەوت و بـەرەو رووتان هات، ئایا ئەو کاتـە هـەر قـەوم و دەستـەی ستەمکاران نیە کە تیادەچن؟

(٤٨) ئێمە پێغەمبەران بـۆ هـیچ شـتێک نـانێرین جگە بۆ مژدەدان نەبێت (بۆ ئیمانداران) و ترساندن نەبێت (بۆ بێباوەڕان)، جـا ئـەوەی ئیمـان و بـاوەڕ بهێنێت و چاکسازی بکات، ئەوە تـەترس و بیمیـان لەسەرە، نە غەمبار دەبن.

(٤٩) ئەوانەش کە بـڕوایـان نەهێنا بـە ئایـەت و فـەرمانەکانی ئێمـە، سـزاو ئـازار یەخـەیان پـێ دەگـرێت و پـێیـانـدا دەچزێـت بـەهۆی ئـەوەی دەرچوون لە فەرمانی خوا.

(٥٠) ئەی محمد ﷺ پێیان بڵێ: من پێتان ناڵێم گەنجینەکانی خوا لای منە، هەروەها لەنهێنی و شاراوەکانیش هیچ نازانم و ئاگادارنیم و پێتان ناڵێم بەڕاستی مـن فریشتـەم، بـەڵکو تەنـها شـوێنی ئـەوە دەکـەوم کـە بـەوەحی و نیگا پێـم دەگـات، (هەروەها) پێیان بڵێ: ئایا کوێرو چاوساغ وەک یەکن؟ (لە ڕاستیدا بێباوەڕ وەک کوێروایە کەلە تاریکایدا گیری خواردبێت و لە هەموو تاوێکی ژیانیداو لە هەموو هەنگاوێکیدا بەتەمای کۆسپ و تەگەرەیە، لەو لاشەوە ئیماندار بیینایە، چاو ساغە، هەموو شتێکی لارروونە، دەزانێت بۆچی هاتووە، بۆچـی دەژی، بـەرەوکوێ دەچێـت) ئایـا بـۆ بیرناکەنـەوە و تێنـافکرن (لـەو راستیانە).

٥١) کەواتە، بە قورئان ئەوانە ئاگادارو هۆشیار بکە کە دەترسن کۆبکرێنەوە بۆ لای پەروەردگاریان، ئەوکاتە کەس نیە جگە لەو پەروەردگارە پشتیوانییان لێبکات، کەسیش نیە تکاکاریان بێت، (ئـەو ئاگـادار کردنەوەیـە) بـۆ ئەوەیـە ئـەوان تـەقواو پارێزکاری بکەن و (لە هەوڵی بەدەستهێنانی رەزامەندیی خوادا بن).

٥٢) ( ئەی محمد ﷺ، ئەی ئیماندار) نەکـەیت ئەوانـە دەربکـەیت (لـە مزگـەوت و کـۆڕی خواناسـین) کـە لـە بـەیانیان و ئێوارانیدا لە پەروەردگاریان دەپاڕێنەوە و(دەیپەرستن) مەبەستیشیان تەنها رەزامەندی ئـەوە، حسـاب و لێپرسـینەوەی هیـچ شتێکی ئەوان لەسەر تۆ نیە و حساب و لێپرسینەوەی هیچ شتێکی تۆیش لەسەر ئەوان نیە، دەرکردنی تۆ بۆ ئەو موسڵمانانە دەبێتە هۆی ئەوەی تۆ بچیتە ریزی ستەمکارانەوە.

وَكَذَٰلِكَ فَتَنَّا بَعْضَهُم بِبَعْضٍ لِّيَقُولُوا أَهَٰؤُلَاءِ مَنَّ اللَّهُ عَلَيْهِم مِّن بَيْنِنَا ۗ أَلَيْسَ اللَّهُ بِأَعْلَمَ بِالشَّاكِرِينَ ﴿٥٣﴾ وَإِذَا جَاءَكَ الَّذِينَ يُؤْمِنُونَ بِآيَاتِنَا فَقُلْ سَلَامٌ عَلَيْكُمْ ۖ كَتَبَ رَبُّكُمْ عَلَىٰ نَفْسِهِ الرَّحْمَةَ ۖ أَنَّهُ مَنْ عَمِلَ مِنكُمْ سُوءًا بِجَهَالَةٍ ثُمَّ تَابَ مِن بَعْدِهِ وَأَصْلَحَ فَأَنَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿٥٤﴾ وَكَذَٰلِكَ نُفَصِّلُ الْآيَاتِ وَلِتَسْتَبِينَ سَبِيلُ الْمُجْرِمِينَ ﴿٥٥﴾ قُلْ إِنِّي نُهِيتُ أَنْ أَعْبُدَ الَّذِينَ تَدْعُونَ مِن دُونِ اللَّهِ ۚ قُل لَّا أَتَّبِعُ أَهْوَاءَكُمْ ۙ قَدْ ضَلَلْتُ إِذًا وَمَا أَنَا مِنَ الْمُهْتَدِينَ ﴿٥٦﴾ قُلْ إِنِّي عَلَىٰ بَيِّنَةٍ مِّن رَّبِّي وَكَذَّبْتُم بِهِ ۚ مَا عِندِي مَا تَسْتَعْجِلُونَ بِهِ ۚ إِنِ الْحُكْمُ إِلَّا لِلَّهِ ۖ يَقُصُّ الْحَقَّ ۖ وَهُوَ خَيْرُ الْفَاصِلِينَ ﴿٥٧﴾ قُل لَّوْ أَنَّ عِندِي مَا تَسْتَعْجِلُونَ بِهِ لَقُضِيَ الْأَمْرُ بَيْنِي وَبَيْنَكُمْ ۗ وَاللَّهُ أَعْلَمُ بِالظَّالِمِينَ ﴿٥٨﴾ ۞ وَعِندَهُ مَفَاتِحُ الْغَيْبِ لَا يَعْلَمُهَا إِلَّا هُوَ ۚ وَيَعْلَمُ مَا فِي الْبَرِّ وَالْبَحْرِ ۚ وَمَا تَسْقُطُ مِن وَرَقَةٍ إِلَّا يَعْلَمُهَا وَلَا حَبَّةٍ فِي ظُلُمَاتِ الْأَرْضِ وَلَا رَطْبٍ وَلَا يَابِسٍ إِلَّا فِي كِتَابٍ مُّبِينٍ ﴿٥٩﴾



(٥٣) ئێمە هەر بەو شێوەیە هەندێکیان بە هەندێکیان تاقیدەکەینەوە (کێشە بۆ یەکتر دروست دەکەن، دەبنە بەلا بۆ یەکتر، یاخود هەندێک هەژار دەکەین و هەندێک دەوڵەمەند.. هتد) تا بێ بڕوایان بڵێن: ئایا ئائەوانە خوا ڕێزی لێناون لەناوماندا ؟! (ئەو هەژارو داماوانە کەی شایستەی ئەوەن خوا هەڵیانبژێرێت و هیدایەتیان بدات) ئایا خوا زانا نیە بە سوپاسگوزاران؟

(٥٤) کاتێک ئەو کەسانە هاتن بۆ لات کە ئیمان بەئایەت و فەرمانەکانی ئێمە دەهێنن (تۆ ئەی محمد ﷺ، ئەی ئیماندار) بڵێ: سلاوتان لێ بێت (ئەم مژدەیەشیان بدەرێ) کە: پەروەردگارتان فەرزی کردووە لەسەر خۆی (کە لە ئاقاری ئێوەدا) بەرەحم ومیهرەبان و دلۆڤان بێت، ئەگەر کەسێکتان بەنەفامیی، بەنەزانیی گوناهێکی کردو لەوەودوا تەوبەی کردو پەشیمان بۆوە و پاش ئەنجامدانی خراپەکە و چاکسازیشی کرد، ئەوە با دڵنیابێت کە پەروەردگار زۆر لێخۆشبوو و میهرەبانە.

(٥٥) هەر بەو شێوەیە کەباسکرا بەدرێژیی (بەڵگەو نیشانەکان) ڕوون دەکەینەوە تا بەجوانی و ئاشکرا، حەق ڕوون بێتەوە و ڕێبازی تاوانبار و خوانەناسان دەربکەوێت و بناسرێت.

(٥٦) (بەبێ باوەڕان) بڵێ: بەڕاستی من قەدەغە کراوم لە پەرستنی ئەوانەی ئێوە دەیانپەرستن لە غەیری خوا (هەروەها) بڵێ: من شوێن ئارەزووەکانی ئێوە ناکەوم (ئەگەر وابکەم)، ئەوە ئیتر بێگومان ئەو کاتە من سەر لێشێواو دەبم و هەرگیز لە هیدایەت دراوان نیم.

(٥٧) پێیان بڵێ: چونکە من زۆر دڵنیام و بە بەڵگەوە پەروەردگارم (دەناسم و دەیپەرستم) کەچی (پێم سەیرە) ئێوە باوەڕتان پێی نیە، ئەوەی ئێوە پەلەتانە بۆتان پێش بێت (لە تۆڵەو سزای خوایی) بەدەست من نیەو لای من نیە، حوکم و فەرمانڕەوایی (هەمووشت) هەر بەدەست خوایە، ئەو زاتە ڕاستی و حەقیقەتەکان دەخاتە ڕوو، چاکترین جیاکەرەوەشە (لە نێوان حەق و بەتاڵدا).

(٥٨) پێیان بڵێ: ئەگەر بەڕاستی ئەوەی ئێوە پەلەتانە لە پێشهاتنی (سزای خوایی) لای من بوایە و بەدەست من بوایە، ئەو کاتە هەموو شت لە نێوانماندا کۆتایی دەهات (ئێوە لەناو دەچوون)، خوایش هەمیشە زانایە بە ستەمکاران.

(٥٩) کلیلی هەموو شاراوەکان و زانینی هەموو نهێنیەکان بەدەست خوایە و هەر لای ئەوە، کەس نایانزانێت جگە لەو زاتە هەرچی لەسەر وشکانیە (لە گیاندارو بێ‌گیان و گیاو دارو زیندەوەرانی وردو درشت لەسەر زەوی و لە توێی خاکدا) خوا پێی دەزانێت، هەروەها هەرچی لە دەریاکانیشدا هەیە (لە زیندەوەری هەمەجۆرو ماسی سەیرو سەمەرە) ئاگای لێیەتی و هیچ گەڵایەک ناکەوێتە خوارەوە خوا پێی نەزانێت، هەروەها دەنکێک یان تۆوێک لە تاریکیەکانی زەویدا نیە، ئەو دەنکە چ شێدار بێت یان وشک بێت، هیچ شتێک نیە لە خوا پەنهان بێت و لە (لوح المحفوظ) دا، یاخود لە دۆسیە و دەزگای تایبەتدا تۆمار نەکرابێت.

وَهُوَ ٱلَّذِي يَتَوَفَّىٰكُم بِٱلَّيۡلِ وَيَعۡلَمُ مَا جَرَحۡتُم بِٱلنَّهَارِ ثُمَّ يَبۡعَثُكُمۡ فِيهِ لِيُقۡضَىٰٓ أَجَلٞ مُّسَمّٗىۖ ثُمَّ إِلَيۡهِ مَرۡجِعُكُمۡ ثُمَّ يُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمۡ تَعۡمَلُونَ ﴿٦٠﴾ وَهُوَ ٱلۡقَاهِرُ فَوۡقَ عِبَادِهِۦۖ وَيُرۡسِلُ عَلَيۡكُمۡ حَفَظَةً حَتَّىٰٓ إِذَا جَآءَ أَحَدَكُمُ ٱلۡمَوۡتُ تَوَفَّتۡهُ رُسُلُنَا وَهُمۡ لَا يُفَرِّطُونَ ﴿٦١﴾ ثُمَّ رُدُّوٓاْ إِلَى ٱللَّهِ مَوۡلَىٰهُمُ ٱلۡحَقِّۚ أَلَا لَهُ ٱلۡحُكۡمُ وَهُوَ أَسۡرَعُ ٱلۡحَٰسِبِينَ ﴿٦٢﴾ قُلۡ مَن يُنَجِّيكُم مِّن ظُلُمَٰتِ ٱلۡبَرِّ وَٱلۡبَحۡرِ تَدۡعُونَهُۥ تَضَرُّعٗا وَخُفۡيَةٗ لَّئِنۡ أَنجَىٰنَا مِنۡ هَٰذِهِۦ لَنَكُونَنَّ مِنَ ٱلشَّٰكِرِينَ ﴿٦٣﴾ قُلِ ٱللَّهُ يُنَجِّيكُم مِّنۡهَا وَمِن كُلِّ كَرۡبٖ ثُمَّ أَنتُمۡ تُشۡرِكُونَ ﴿٦٤﴾ قُلۡ هُوَ ٱلۡقَادِرُ عَلَىٰٓ أَن يَبۡعَثَ عَلَيۡكُمۡ عَذَابٗا مِّن فَوۡقِكُمۡ أَوۡ مِن تَحۡتِ أَرۡجُلِكُمۡ أَوۡ يَلۡبِسَكُمۡ شِيَعٗا وَيُذِيقَ بَعۡضَكُم بَأۡسَ بَعۡضٍۗ ٱنظُرۡ كَيۡفَ نُصَرِّفُ ٱلۡأٓيَٰتِ لَعَلَّهُمۡ يَفۡقَهُونَ ﴿٦٥﴾ وَكَذَّبَ بِهِۦ قَوۡمُكَ وَهُوَ ٱلۡحَقُّۚ قُل لَّسۡتُ عَلَيۡكُم بِوَكِيلٖ ﴿٦٦﴾ لِّكُلِّ نَبَإٖ مُّسۡتَقَرّٞۚ وَسَوۡفَ تَعۡلَمُونَ ﴿٦٧﴾ وَإِذَا رَأَيۡتَ ٱلَّذِينَ يَخُوضُونَ فِيٓ ءَايَٰتِنَا فَأَعۡرِضۡ عَنۡهُمۡ حَتَّىٰ يَخُوضُواْ فِي حَدِيثٍ غَيۡرِهِۦۚ وَإِمَّا يُنسِيَنَّكَ ٱلشَّيۡطَٰنُ فَلَا تَقۡعُدۡ بَعۡدَ ٱلذِّكۡرَىٰ مَعَ ٱلۡقَوۡمِ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٦٨﴾

(٦٠) هەر ئەو زاتەیە بەشەو خەوتان لێ دەخات و دەتانمرێنێت (لەم سالانەی دوایدا زاناکان بۆیان دەرکەوتووە کە خەو جۆرە مردنێکە)، هەروەها دەزانێت لە ڕۆژیشدا چ کارو کردەوەیەک ئەنجام دەدەن، (هەموو ڕۆژێک ژیانتان پێدەبەخشێت) و پاشان زیندووتان دەکاتەوە بۆ ئەوەی وادەی دیاری کراو کە (ڕۆژانی تەمەنتانە) تەواو بکرێت و (خەوێکی گەورەتان لێدەکەوێت) لەوەودوا گەڕانەوەتان هەر بۆ لای ئەو زاتەیە، پاشان هەواڵی ئەو کارو کردەوانەتان پێڕادەگەیەنێت کەکاتی خۆی ئەنجامتان دەدا.

(٦١) ئەو زاتە دەسەلاتداری بێسنوورە بەسەر بەندەکانیدا، چەندەها (فریشتەی) چاودێرو تۆمارکەر دەنێرێت بۆ سەرتان هەتا ئەو کاتەی مەرگ دێت و یەخە بەکەسێکتان دەگرێت، ئەو کاتە ئیتر (فریشتە) ڕەوانە کراوەکانمان گیانی دەکێشن و لە کاتێکدا ئەوان لە کارو کردەوەی خۆیان کەمتەرخەمی ناکەن.

(٦٢) پاشان خەڵکی هەموویان گەڕێنرانەوە بۆ لای خوا کە سەروەریی ڕاستەقینەیانە، ئاگاداربن کە حوکم و فەرمانڕەوایی هەر بەدەست ئەوەو ئەو زاتە خێراو لەماوەیەکی کەمدا لە هەمووان دەپرسێتەوە.

(٦٣) ئەی محمد ﷺ پێیان بڵێ: کێ فریاتان دەکەوێت و ڕزگارتان دەکات لە تاریکیەکانی وشکانی و دەریادا، (کاتێک گیردەخۆن) و بە کەساسی لێی دەپاڕێنەوە، بەنهێنی هانای بۆ دەبەن، (پەیمان دەدەن و دەڵێن) سوێند بێت بە خوا ئەگەر لەم تەنگانەیە ڕزگارمان بکەیت، ئەوە بەدڵنیاییەوە دەچینە ڕیزی سوپاسگوزارانەوە.

(٦٤) جا لە وەڵامیاندا بڵێ: خوا لەو تاریکیانە و لە هەموو کۆسپێک ڕزگارتان دەکات، کەچی پاشان (زۆربەتان) هاوەڵ و شەریکی بۆ بڕیار دەدەن.

(٦٥) پێیان بڵێ: هەر ئەو زاتە بەتوانایە و دەتوانێت سزای سەختتان لەسەروتانەوە بۆ بنێرێت یان لە ژێر پێتانەوە یاخود بتانکاتە دەستە دەستە و پارچە پارچە و تالاوی توندو تیژی هەندێکتان بکات بەگەرووی هەندێکی ترتاندا، تەماشا بکە چۆن چەندەها بەڵگەی جۆراو جۆریان بۆ دەهێنینەوە، بۆ ئەوەی ئەوان تێبگەن.

(٦٦) (لەگەڵ ئەوەشدا) قەومەکەی تۆ ئەم بەرنامە و قورئانەیان بەدرۆزانی، لەکاتێکدا هەر ئەوەیە حەقیقەت و ڕاستی پێیان بڵێ: ئەوە ئیترمن دەسەڵاتی ڕزگار کردنی ئێوەم نیە و من پشتیوانی ئێوە نیم (ئەگەر خوا بەڵایەکتان بەسەر بهێنێت).

(٦٧) بۆ هەموو هەواڵێک (کە لە قورئاندا هاتووە) کات و شوێنی بەدی هاتنی خۆی هەیە، لە ئایندەشدا دەیزانن.

(٦٨) کاتێکیش ئەوانەت بینی کە دەم لە ئایەتەکانی ئێمەوە دەدەن و (دەیکەنە گاڵتەجاڕی خۆیان) ئەوە تۆ پشتیان تێ بکەو کۆڕو کۆبوونەوەیان بەجێ بهێڵە هەتا ئەو کاتەی دەچنە ناو باسێکی ترەوە، کاتێکیش ئەگەر شەیتان لە بیری بردیتەوە (کە دوور بکەویتەوە لێیان) جا دوای ئەوەی کە بیرت هاتەوە لەگەڵ قەومی ستەمکاران دامەنیشە.

وَمَا عَلَى ٱلَّذِينَ يَتَّقُونَ مِنْ حِسَابِهِم مِّن شَيْءٍ وَلَٰكِن ذِكْرَىٰ لَعَلَّهُمْ يَتَّقُونَ ﴿٦٩﴾ وَذَرِ ٱلَّذِينَ ٱتَّخَذُوا۟ دِينَهُمْ لَعِبًا وَلَهْوًا وَغَرَّتْهُمُ ٱلْحَيَوٰةُ ٱلدُّنْيَا ۚ وَذَكِّرْ بِهِۦٓ أَن تُبْسَلَ نَفْسٌۢ بِمَا كَسَبَتْ لَيْسَ لَهَا مِن دُونِ ٱللَّهِ وَلِىٌّ وَلَا شَفِيعٌ وَإِن تَعْدِلْ كُلَّ عَدْلٍ لَّا يُؤْخَذْ مِنْهَآ ۗ أُو۟لَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ أُبْسِلُوا۟ بِمَا كَسَبُوا۟ ۖ لَهُمْ شَرَابٌ مِّنْ حَمِيمٍ وَعَذَابٌ أَلِيمٌۢ بِمَا كَانُوا۟ يَكْفُرُونَ ﴿٧٠﴾ قُلْ أَنَدْعُوا۟ مِن دُونِ ٱللَّهِ مَا لَا يَنفَعُنَا وَلَا يَضُرُّنَا وَنُرَدُّ عَلَىٰٓ أَعْقَابِنَا بَعْدَ إِذْ هَدَىٰنَا ٱللَّهُ كَٱلَّذِى ٱسْتَهْوَتْهُ ٱلشَّيَٰطِينُ فِى ٱلْأَرْضِ حَيْرَانَ لَهُۥٓ أَصْحَٰبٌ يَدْعُونَهُۥٓ إِلَى ٱلْهُدَى ٱئْتِنَا ۗ قُلْ إِنَّ هُدَى ٱللَّهِ هُوَ ٱلْهُدَىٰ ۖ وَأُمِرْنَا لِنُسْلِمَ لِرَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٧١﴾ وَأَنْ أَقِيمُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ وَٱتَّقُوهُ ۚ وَهُوَ ٱلَّذِىٓ إِلَيْهِ تُحْشَرُونَ ﴿٧٢﴾ وَهُوَ ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ بِٱلْحَقِّ ۖ وَيَوْمَ يَقُولُ كُن فَيَكُونُ ۚ قَوْلُهُ ٱلْحَقُّ ۚ وَلَهُ ٱلْمُلْكُ يَوْمَ يُنفَخُ فِى ٱلصُّورِ ۚ عَٰلِمُ ٱلْغَيْبِ وَٱلشَّهَٰدَةِ ۚ وَهُوَ ٱلْحَكِيمُ ٱلْخَبِيرُ ﴿٧٣﴾

(٦٩) (هەرچەندە) تاوانی نەفامان هیچ کار ناکاتە سەر پاداشتی ئەوانەی خواناس و دیندارن، بەڵام (ئەو هەڵوێستەی پێشوو) یادخستنەوەیە، بۆ ئەوەی خۆیان بپارێزن (لەو کۆڕو کۆمەڵانە و یاخیەکانیش دابچڵەکێن).

(٧٠) (ئەی محمد ﷺ، ئەی ئیماندار) وازلەوانە بهێنە کە ئاینی خۆیان کردووە بەگاڵتەوگاڵتەجار و ژیانی دنیا فریوی داون و سەر لێشێواوی کردوون، یادیان بهێنەرەوە بەقورئان تا کەس تیا نەچێت بەهۆی کارو کردەوەی ناڵەباریەوە، ئەو کاتە جگە لە خوا کەس نەبێت پشتیوانی بێت، کەسیش نەبێت تکاکاری بێت، چونکە کابرای خوانەناس هەرچیەکی ببێت و بیەوێت بیکاتە بارمتەو فیدیەی خۆی، لێی وەرناگیرێت، ئا ئەوانە کەسانێکن کە گرفتار بوون و تیاچوون بە دەست کارو کردەوەی ناڵەباری خۆیانەوە، بۆ ئەوانە خواردنەوە و ئاوی لەکوڵ و سزای بەئێش ئامادەیە، بەهۆی بێ باوەڕ بوونیانەوە.

(٧١) پێیان بڵێ: (ئایا ڕەوایە)پەرستن و هاناو هاوار بۆ کەسێک یان بۆ شتێک بەرین، کە نە دەتوانێت قازانجمان پێبگەیەنێت نە زیان، ئایا ڕاستە پاشگەز بکرێینەوە دوای ئەوەی خوا هیدایەتی داین، ئێمە وەکو ئەو کەسە بین کە شەیتانەکان دەستیان لێوەشاند بێت و شێتیان کردبێت، بەسەر زەویدا سەرگەردان بسوڕێتەوە و چەند هاوەڵێکی (دڵسۆز)ی هەبێت، بانگی بکەن بۆ ڕێبازی هیدایەت و (بەسۆزەوە پێی بڵێن): وەرە بۆ لای ئێمە، (ئەی محمد ﷺ، ئەی ئیماندار) تۆ بڵێ: بەڕاستی من دڵنیام کە هەر ڕێنموویی خوا (ئاینی ئیسلام) ڕێنموویی تەواوە، ئێمە فەرمانمان پێدراوە کە تەسلیم و فەرمانبەرداری پەروەردگاری جیهانیان ببین، (بە قسەی شەیتانەکان نەکەین).

(٧٢) هەروەها (فەرمانمان پێدراوە): نوێژو دروشمەکانی بەچاکی ئەنجام بدەن و لە خەشم و قینی خوا خۆتان بپارێزن، ئەو پەروەردگارە ئەوەیە کە هەر بۆ لای ئەو کۆ دەکرێینەوە.

(٧٣) هەر ئەو زاتە ئاسمانەکان و زەوی لەسەر بنچینەو بناغەی حەق و ڕاستی دروست کردووە، هەر ڕۆژێک هەر کاتێک فەرمان (بە نەمان و لەناوچوونی بدات) بێ دواکەوتن پێش دێت، فەرمان و گوفتاری ئەوزاتە هەمیشە ڕاست و بەجێیە و ئەنجامدراوە، لەو ڕۆژەی فوو دەکرێت بە (صور) دا دەسەڵات تەنها بۆ خوایە، هەر ئەو زانای نهێنی و ئاشکرایە، هەر ئەویش خوایەکی دانا و ئاگایە (بە هەموو بەدیهێنراوەکانی).



۞ وَإِذْ قَالَ إِبْرَٰهِيمُ لِأَبِيهِ ءَازَرَ أَتَتَّخِذُ أَصْنَامًا ءَالِهَةً إِنِّىٓ أَرَىٰكَ وَقَوْمَكَ فِى ضَلَٰلٍ مُّبِينٍ ﴿٧٤﴾ وَكَذَٰلِكَ نُرِىٓ إِبْرَٰهِيمَ مَلَكُوتَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَلِيَكُونَ مِنَ ٱلْمُوقِنِينَ ﴿٧٥﴾ فَلَمَّا جَنَّ عَلَيْهِ ٱلَّيْلُ رَءَا كَوْكَبًا قَالَ هَٰذَا رَبِّى فَلَمَّآ أَفَلَ قَالَ لَآ أُحِبُّ ٱلْءَافِلِينَ ﴿٧٦﴾ فَلَمَّا رَءَا ٱلْقَمَرَ بَازِغًا قَالَ هَٰذَا رَبِّى فَلَمَّآ أَفَلَ قَالَ لَئِن لَّمْ يَهْدِنِى رَبِّى لَأَكُونَنَّ مِنَ ٱلْقَوْمِ ٱلضَّآلِّينَ ﴿٧٧﴾ فَلَمَّا رَءَا ٱلشَّمْسَ بَازِغَةً قَالَ هَٰذَا رَبِّى هَٰذَآ أَكْبَرُ فَلَمَّآ أَفَلَتْ قَالَ يَٰقَوْمِ إِنِّى بَرِىٓءٌ مِّمَّا تُشْرِكُونَ ﴿٧٨﴾ إِنِّى وَجَّهْتُ وَجْهِىَ لِلَّذِى فَطَرَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ حَنِيفًا وَمَآ أَنَا۠ مِنَ ٱلْمُشْرِكِينَ ﴿٧٩﴾ وَحَآجَّهُۥ قَوْمُهُۥ قَالَ أَتُحَٰٓجُّوٓنِّى فِى ٱللَّهِ وَقَدْ هَدَىٰنِ وَلَآ أَخَافُ مَا تُشْرِكُونَ بِهِۦٓ إِلَّآ أَن يَشَآءَ رَبِّى شَيْـًٔا وَسِعَ رَبِّى كُلَّ شَىْءٍ عِلْمًا أَفَلَا تَتَذَكَّرُونَ ﴿٨٠﴾ وَكَيْفَ أَخَافُ مَآ أَشْرَكْتُمْ وَلَا تَخَافُونَ أَنَّكُمْ أَشْرَكْتُم بِٱللَّهِ مَا لَمْ يُنَزِّلْ بِهِۦ عَلَيْكُمْ سُلْطَٰنًا فَأَىُّ ٱلْفَرِيقَيْنِ أَحَقُّ بِٱلْأَمْنِ إِن كُنتُمْ تَعْلَمُونَ ﴿٨١﴾

(٧٤) (بەسەرهاتی سەدەکانی رابوردوو بێنەوە یادیان) کاتێک ئیبراهیم بە ئازەری باوکی وت: ئایا ڕاستە چەند بتێک بکەیتە خوا؟! بەڕاستی من دەبینم تۆش و قەومەکەشت لەناو گومڕاییەکی ئاشکرادان.

(٧٥) بەو شێوەیەش دەسەڵاتی تۆکمەمان لە ئاسمانەکان و زەویدا نیشانی ئیبراهیم دەدەین بۆ ئەوەی بەڵگە بەدەست بێت و لە ریزی دڵنیاکاندا بێت.

(٧٦) ئینجا کاتێک شەو باڵی کێشا بەسەر ئیبراهیمدا ئەستێرەیەکی (گەشی گەورەی) بینی، بۆیە وتی: ئاگاداربن، وادابنێین ئەمە پەروەردگارمە، کاتێک ئەستێرەکەی لێ ئاوا بوو وتی: من شتی لەبەرچاو ون بووم خۆش ناوێت و نایپەرستم.

(٧٧) ئینجا کاتێک مانگی بینی هەڵهات، وتی: ئاگادارین، وادابنێین ئەمەیان پەروەردگارمە، کاتێک ئەویش ئاوا بوو وتی: سوێند بێت بە خوا ئەگەر پەروەردگارم هیدایەتی نەدامایە، ئەوە بێگومان لە ریزی دەستەی گومڕاکاندا دەبووم.

(٧٨) ئینجا کاتێک خۆری بینی هەڵهات، وتی: ئاگادارین، وادابنێین ئەمەیان پەروەردگارمە، ئەمە گەورەتریشە کاتێک ئەویش ئاوابوو وتی: ئەی خەڵکینە، ئەی خزمینە، بەڕاستی من بەریم لەو شتانەی ئێوە کردووتانە بەهاوەڵ و شەریک (بۆ پەروەردگار).

(٧٩) بەڕاستی من رووی خۆم و دڵم لە پەرستندا کردۆتە ئەو زاتەی ئاسمانەکان و زەوی فەراهەم هێناوە، لەکاتێکدا رووم لەهیچ شتێکی ترناکەم، بەدڵنارامی تەواویشەوە (دەڵێم کە): هەرگیز من لە ریزی موشریک و هاوەڵگەراندانیم.

(٨٠) (کەچی قەومە نالەبارەکەشی) کەوتنە موجادەلەو دەمەدەمێ دژی (لە وەڵامیاندا ئیبراهیم وتی): ئایا ئێوە دەربارەی خوای (تاکو تەنها) لەگەڵ مندا دەمەدەمێ و موجادەلە دەکەن؟ لەکاتێکدا ئەو بەڕاستی هیدایەتی داوم و رێبازی راستی نیشانداوم و ناشترسم لەو شتانەی کە ئێوە دەیکەن بەشەریکی خوا (چونکە ناتوانن زیانێکم پێ بگەیەنن) مەگەر ویستی پەروەردگارمی لەسەربێت و بیەوێت شتێکم بەسەردا بهێنێت، پەروەردگارم بەزانست و زانیاری هەموو شتێکی گرتۆتەوە، ئایا ئەوە بیرناکەنەوە و یاداوەری وەرناگرن؟

(٨١) من چۆن لەو شتانە دەترسم کە ئێوە لە جیاتی خوا دەیانپەرستن و چۆن ئێوە ناترسن لەوەی کە شەریک و هاوەڵتان بۆ خوا بڕیارداوە بەبێ هیچ بەڵگەیەک کە خوا ناردبێتی بۆتان، جا کەواتە کام دەستە شایستەی ئەوەیە بێ ترس و بیم بێت و بە ئاسوودەیی بژی؟ ئەگەر ئێوە دەزانن ئەوە پێم بڵێن؟...

ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَلَمْ يَلْبِسُوٓاْ إِيمَٰنَهُم بِظُلْمٍ أُوْلَٰٓئِكَ لَهُمُ ٱلْأَمْنُ وَهُم مُّهْتَدُونَ ﴿٨٢﴾ وَتِلْكَ حُجَّتُنَآ ءَاتَيْنَٰهَآ إِبْرَٰهِيمَ عَلَىٰ قَوْمِهِۦ ۚ نَرْفَعُ دَرَجَٰتٍ مَّن نَّشَآءُ ۗ إِنَّ رَبَّكَ حَكِيمٌ عَلِيمٌ ﴿٨٣﴾ وَوَهَبْنَا لَهُۥٓ إِسْحَٰقَ وَيَعْقُوبَ ۚ كُلًّا هَدَيْنَا ۚ وَنُوحًا هَدَيْنَا مِن قَبْلُ ۖ وَمِن ذُرِّيَّتِهِۦ دَاوُۥدَ وَسُلَيْمَٰنَ وَأَيُّوبَ وَيُوسُفَ وَمُوسَىٰ وَهَٰرُونَ ۚ وَكَذَٰلِكَ نَجْزِى ٱلْمُحْسِنِينَ ﴿٨٤﴾ وَزَكَرِيَّا وَيَحْيَىٰ وَعِيسَىٰ وَإِلْيَاسَ ۖ كُلٌّ مِّنَ ٱلصَّٰلِحِينَ ﴿٨٥﴾ وَإِسْمَٰعِيلَ وَٱلْيَسَعَ وَيُونُسَ وَلُوطًا ۚ وَكُلًّا فَضَّلْنَا عَلَى ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٨٦﴾ وَمِنْ ءَابَآئِهِمْ وَذُرِّيَّٰتِهِمْ وَإِخْوَٰنِهِمْ ۖ وَٱجْتَبَيْنَٰهُمْ وَهَدَيْنَٰهُمْ إِلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ ﴿٨٧﴾ ذَٰلِكَ هُدَى ٱللَّهِ يَهْدِى بِهِۦ مَن يَشَآءُ مِنْ عِبَادِهِۦ ۚ وَلَوْ أَشْرَكُواْ لَحَبِطَ عَنْهُم مَّا كَانُواْ يَعْمَلُونَ ﴿٨٨﴾ أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ ءَاتَيْنَٰهُمُ ٱلْكِتَٰبَ وَٱلْحُكْمَ وَٱلنُّبُوَّةَ ۚ فَإِن يَكْفُرْ بِهَا هَٰٓؤُلَآءِ فَقَدْ وَكَّلْنَا بِهَا قَوْمًا لَّيْسُواْ بِهَا بِكَٰفِرِينَ ﴿٨٩﴾ أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ هَدَى ٱللَّهُ ۖ فَبِهُدَىٰهُمُ ٱقْتَدِهْ ۗ قُل لَّآ أَسْـَٔلُكُمْ عَلَيْهِ أَجْرًا ۖ إِنْ هُوَ إِلَّا ذِكْرَىٰ لِلْعَٰلَمِينَ ﴿٩٠﴾

(٨٢) ئەوانەی ئیمان و باوەڕیان هێناوە و ستەم و هاوەڵگەریان تێکەڵ بە ئیمانەکەیان نەکردووە، ئاسوودەیی و هێمنی هەر بۆ ئەوانەیە، هەر ئەوانەش ڕێنموومایی کراون.

(٨٣) ئەو وتو وێژو لێکۆڵینەوانە بەڵگە و نیشانەی ئێمە بوو، کاتێک بەخشیمانن بە ئیبراهیم لەسەر گەلەکەی و زاڵ بوو بەسەریاندا، قسەو بیروباوەڕی بەسەر قەومەکەیدا سەرکەوت، جا هەر کەسێک بمانەوێت و (خۆیشی شایستە بێت) چەندەها پلەوپایەی بەرز دەکەینەوە، بەڕاستی پەروەردگاری تۆ دانا و کار بەجێیە و زانایە بەهەموو شتێک.

(٨٤) (لەوەودوا) ئیسحاق و یەعقوبمان پێبەخشی، هەریەک لەوانمان ڕێنموویی کرد، پێشتریش نوحمان ڕێنمووییی کردبوو و لە نەوەکانی (تری ئیبراهیم) داود و سلیمان و ئەیوب و یوسف و موسا و هاروون (هاتنە دنیاوە و بوونە رابەرو چاوساغ بۆ خەڵکی) ئا بەو شێوەیە پاداشتی چاکەخوازان دەدەینەوە (نەوەی چاکو پاک و خواناسیان پێدەبەخشین).

(٨٥) (هەروەها) زەکەریا و یەحیا و عیسا و ئیلیاس هەر هەموویان لە پاک و چاکان بوون.

(٨٦) ئیسماعیل و یەسەع و یونس و لوطیش (لە هیدایەت دراوو پێغەمبەران بوون) هەریەکە لەوانیشمان ڕێزدارکرد بەسەر هەموو خەڵکی جیهانی (سەردەمی خۆیاندا).

(٨٧) هەروەها هەندێک لە باوانیان و نەوەکانیان و براکانیانمان هەڵبژاردو هیدایەت و ڕێنموویمان کردن بۆ ڕێگەو ڕێبازی ڕاست و دروست.

(٨٨) ئەوەیە هیدایەت و ڕێنمووییی خوایی کە هیدایەت و ڕێنمووییی هەر کەسێکی پێ دەدات لە بەندەکانی (کە شایستە بێت) خۆ ئەگەر شەریک و هاوبەش بڕیار بدەن، ئەوە هەرچی کارو کردەوەیەکی (چاکیشیان) هەیە هەمووی پووچ و بێ نرخ دەبێت.

(٨٩) ئا ئەوانەی (کە ناوبران) ئەوانەن کتێبی (ئاسمانی) و دەسەڵات و فەرمانڕەوایی و پێغەمبەرایەتیمان پێ بەخشیوون، جا ئەگەر ئەوانە بڕوایان پێی نەبێت (لە نەفامان)، ئەوە بەڕاستی بەکەسانێکی ترمان (لە ژیرو هۆشمەندەکان) سپارد و بڕوایان پێیەتی و پشتیوانیی لێدەکەن و پێی بێ باوەڕ نین.

(٩٠) ئەو (ناوبراوانە) ئەو کەسانەن کە خوا (بەتایبەت) هیدایەت و ڕێنمووییی کردوون، تۆش (ئەی محمد ﷺ، ئەی ئیماندار) شوێنی هیدایەت و ڕێنمووییی ئەوانە بکەوە (هەروەها بەو خەڵکە) بڵێ: کە من هیچ جۆرە کرێ و پاداشتێکتان لەسەر ڕێنمووییی لێ داوا ناکەم، ئەم قورئان و بەرنامەیەش(کە بەمندا ڕەوانەکراوە) تەنها یادخەرەوەیە بۆ هەموو خەڵکی سەر ئەم زەویە.

وَمَا قَدَرُوا اللَّهَ حَقَّ قَدْرِهِ إِذْ قَالُوا مَا أَنزَلَ اللَّهُ عَلَىٰ بَشَرٍ مِّن شَيْءٍ ۗ قُلْ مَنْ أَنزَلَ الْكِتَابَ الَّذِي جَاءَ بِهِ مُوسَىٰ نُورًا وَهُدًى لِّلنَّاسِ ۖ تَجْعَلُونَهُ قَرَاطِيسَ تُبْدُونَهَا وَتُخْفُونَ كَثِيرًا ۖ وَعُلِّمْتُم مَّا لَمْ تَعْلَمُوا أَنتُمْ وَلَا آبَاؤُكُمْ ۖ قُلِ اللَّهُ ۖ ثُمَّ ذَرْهُمْ فِي خَوْضِهِمْ يَلْعَبُونَ ﴿٩١﴾ وَهَٰذَا كِتَابٌ أَنزَلْنَاهُ مُبَارَكٌ مُّصَدِّقُ الَّذِي بَيْنَ يَدَيْهِ وَلِتُنذِرَ أُمَّ الْقُرَىٰ وَمَنْ حَوْلَهَا ۚ وَالَّذِينَ يُؤْمِنُونَ بِالْآخِرَةِ يُؤْمِنُونَ بِهِ ۖ وَهُمْ عَلَىٰ صَلَاتِهِمْ يُحَافِظُونَ ﴿٩٢﴾ وَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّنِ افْتَرَىٰ عَلَى اللَّهِ كَذِبًا أَوْ قَالَ أُوحِيَ إِلَيَّ وَلَمْ يُوحَ إِلَيْهِ شَيْءٌ وَمَن قَالَ سَأُنزِلُ مِثْلَ مَا أَنزَلَ اللَّهُ ۗ وَلَوْ تَرَىٰ إِذِ الظَّالِمُونَ فِي غَمَرَاتِ الْمَوْتِ وَالْمَلَائِكَةُ بَاسِطُو أَيْدِيهِمْ أَخْرِجُوا أَنفُسَكُمُ ۖ الْيَوْمَ تُجْزَوْنَ عَذَابَ الْهُونِ بِمَا كُنتُمْ تَقُولُونَ عَلَى اللَّهِ غَيْرَ الْحَقِّ وَكُنتُمْ عَنْ آيَاتِهِ تَسْتَكْبِرُونَ ﴿٩٣﴾ وَلَقَدْ جِئْتُمُونَا فُرَادَىٰ كَمَا خَلَقْنَاكُمْ أَوَّلَ مَرَّةٍ وَتَرَكْتُم مَّا خَوَّلْنَاكُمْ وَرَاءَ ظُهُورِكُمْ ۖ وَمَا نَرَىٰ مَعَكُمْ شُفَعَاءَكُمُ الَّذِينَ زَعَمْتُمْ أَنَّهُمْ فِيكُمْ شُرَكَاءُ ۚ لَقَد تَّقَطَّعَ بَيْنَكُمْ وَضَلَّ عَنكُم مَّا كُنتُمْ تَزْعُمُونَ ﴿٩٤﴾

(٩١) (جولەکە) وەکو پێویست قەدری خوایان نەگرت، ڕێزیان بۆ دانەنا، چونکە وتیان: خوا هیچ کتێبێکی بۆ هیچ کەس دانەبەزاندوە، پێیان بڵێ: باشە ئەی کێ ئەو کتێبەی دابەزاند کە موسا هێنای (بۆتان)، لەکاتێکدا نوورو هیدایەتیش بوو بۆ خەڵکی، کەچی ئێوە بەش بەش و پارچە پارچەی دەکەن و ئەوەی بەدڵتان بێت نیشانی خەڵکی دەدەن و زۆریشی دەشارنەوە (بەتایبەت دەربارەی پێغەمبەر و قورئان) هەروەها بڵێ هەندێک شت فێرکران کە نە ئێوە نە باو و باپیرانتان دەتانزانی، پێیان بڵێ: هەر خوا خۆی دایبەزاندوە و فێریشی کردوون، لەوەودوا وازیان لێ بهێنە با لە بەتاڵ و نادروستی خۆیاندا ڕۆبچن وگەمەو یاری بکەن!!

(٩٢) ئەم(قورئانە) کتێبێکی پیرۆزە، دامان بەزاندوە، ڕاستی کتێبەکانی پێشوو دەسەلمێنێت (بە تایبەت تەورات و ئینجیل، کە ئەوانیش لەلایەن خواوە ڕەوانە کراون) هەروەها ناردوومانە تا شارە دێرینەکە (مەککەی پیرۆز) و هەموو دەوروبەری داچڵەکێنێت و (بانگیان بکات بۆ ئیسلام، کە دانیشتووانی هەموو گۆی زەوی دەگرێتەوە) جا ئەوانەی کە باوەڕ بەڕۆژی دوایی دەهێنن، بڕوا بە قورئانیش دە هێنن و لەسەر نوێژەکانیان بەردەوامن و هەمیشە لەکاتی خۆیدا ئەنجامی دەدەن و دەیپارێزن.

(٩٣) کێ لەوە ستەمکارترە کە درۆ بۆ خوا هەڵبەستێت و یاخود بڵێت: منیش وەحی و نیگام بۆ هاتووە، لە ڕاستیشدا هیچی بۆ نەهاتبێت، هەروەها ئەو کەسەش کە وتویەتی: منیش وەک قورئان کتێبێک دادەبەزێنم وەک خوا دایبەزاندوە، خۆ ئەگەر ئەو ستەمکارانە ببینی چۆن لە ئێش و ئازاری سەرەمەرگدا (گیرێکیان خواردووە) فریشتەکانیش دەستیان لێدەکەنەوە و لێیان دەدەن و (پێیان دەڵێن): ئادەی گیانتان بدەن بەدەستەوە، دەی ڕۆحتان دەرکەن، ئەمڕۆ لە تۆڵەی (خوا نەناسیتاندا) سزاو ئەشکەنجەی ڕیسوایی و شەرمەزاری دەدرێن، چونکە شتی ناحەقتان بەدەم خواوە هەڵدەبەست و خۆتان بەگەورە دەزانی لە بەرامبەر ئایەت و فەرمانەکانی خوادا و لووت بەرزیتان نەیدەهێشت باوەڕی پێ بهێنن.

(٩٤) (لە ڕۆژی قیامەتدا خوای گەورە ڕوو بە خوانەناسان دەفەرموێت) سوێند بەخوا بێگومان ئێوە بە تەنها و تاک تاک هاتوونەتە لامان هەروەکو یەکەم جار دروستمان کردن و هەرچی پێمان بەخشی بوون و بەکارتان دەهێنا بەجێتان هێشتووە لە دوایی خۆتانەوە و ناشبینین لەگەڵتان ئەو کەس و شتانەی کە ئێوە دەتانوت تکاکارن بۆمان و فریامان دەکەون، سوێند بەخوا بەڕاستی هەرچی پەیوەندیەک هەبوو لە نێوانتاندا پچڕاوەو هەرچی ئومێدتان پێی هەبوو لاقتان پێوە لێدەدا لێتان ون بوو.



۞ إِنَّ ٱللَّهَ فَالِقُ ٱلْحَبِّ وَٱلنَّوَىٰ ۖ يُخْرِجُ ٱلْحَىَّ مِنَ ٱلْمَيِّتِ وَمُخْرِجُ ٱلْمَيِّتِ مِنَ ٱلْحَىِّ ۚ ذَٰلِكُمُ ٱللَّهُ ۖ فَأَنَّىٰ تُؤْفَكُونَ ﴿٩٥﴾ فَالِقُ ٱلْإِصْبَاحِ وَجَعَلَ ٱلَّيْلَ سَكَنًا وَٱلشَّمْسَ وَٱلْقَمَرَ حُسْبَانًا ۚ ذَٰلِكَ تَقْدِيرُ ٱلْعَزِيزِ ٱلْعَلِيمِ ﴿٩٦﴾ وَهُوَ ٱلَّذِى جَعَلَ لَكُمُ ٱلنُّجُومَ لِتَهْتَدُوا۟ بِهَا فِى ظُلُمَٰتِ ٱلْبَرِّ وَٱلْبَحْرِ ۗ قَدْ فَصَّلْنَا ٱلْءَايَٰتِ لِقَوْمٍ يَعْلَمُونَ ﴿٩٧﴾ وَهُوَ ٱلَّذِىٓ أَنشَأَكُم مِّن نَّفْسٍ وَٰحِدَةٍ فَمُسْتَقَرٌّ وَمُسْتَوْدَعٌ ۗ قَدْ فَصَّلْنَا ٱلْءَايَٰتِ لِقَوْمٍ يَفْقَهُونَ ﴿٩٨﴾ وَهُوَ ٱلَّذِىٓ أَنزَلَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءً فَأَخْرَجْنَا بِهِۦ نَبَاتَ كُلِّ شَىْءٍ فَأَخْرَجْنَا مِنْهُ خَضِرًا نُّخْرِجُ مِنْهُ حَبًّا مُّتَرَاكِبًا وَمِنَ ٱلنَّخْلِ مِن طَلْعِهَا قِنْوَانٌ دَانِيَةٌ وَجَنَّٰتٍ مِّنْ أَعْنَابٍ وَٱلزَّيْتُونَ وَٱلرُّمَّانَ مُشْتَبِهًا وَغَيْرَ مُتَشَٰبِهٍ ۗ ٱنظُرُوٓا۟ إِلَىٰ ثَمَرِهِۦٓ إِذَآ أَثْمَرَ وَيَنْعِهِۦٓ ۚ إِنَّ فِى ذَٰلِكُمْ لَءَايَٰتٍ لِّقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ ﴿٩٩﴾ وَجَعَلُوا۟ لِلَّهِ شُرَكَآءَ ٱلْجِنَّ وَخَلَقَهُمْ ۖ وَخَرَقُوا۟ لَهُۥ بَنِينَ وَبَنَٰتٍۭ بِغَيْرِ عِلْمٍ ۚ سُبْحَٰنَهُۥ وَتَعَٰلَىٰ عَمَّا يَصِفُونَ ﴿١٠٠﴾ بَدِيعُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۖ أَنَّىٰ يَكُونُ لَهُۥ وَلَدٌ وَلَمْ تَكُن لَّهُۥ صَٰحِبَةٌ ۖ وَخَلَقَ كُلَّ شَىْءٍ ۖ وَهُوَ بِكُلِّ شَىْءٍ عَلِيمٌ ﴿١٠١﴾

(٩٥) بەڕاستی خوا لـەتکـەری دەنـک و دانەوێڵەیـە بۆ ئەوەی پیشکوێنێت و بڕوێت، زیندووش لە مردوو دەردەهێنێت، دەرهێنەری مردووشە لـە زینـدوو، ئـا ئەوەیـە خـوای پەروەردگـارتان، جـا ئیـتر بـۆ کـوێ لادەدرێن و بۆ کوێ وێڵ دەکرێن.

(٩٦) (هەرئەو زاتەیە) بـەیانیان فەراهـەم دەهێنێت و ئاسۆ روناک دەکاتـەوە و شـەوی کـردووە بـەهۆی ئارامی و خامۆشی، رۆژو مانگیشـی کـردووە بـەهۆی راگرتنـی حسـاب، ئـەو شـتانە هـەمووی بەنەخشـەی خوای بالادەست و زانا کێشراوە.

(٩٧) هەر ئەو زاتە، ئەستێرەی بۆ فەراهەم هێناون تا ببێتـە هـۆی رێنموویتـان لـەناو تاریکیـەکانی سـەر رووکاری وشکانی و دەریاکاندا، بەڕاستی ئێمە نیشانە و بەڵگـەی زۆرمـان (لەسـەر دەسـەڵاتی خۆمـان و رێکوپێکی کارمان) روون کردۆتەوە بۆ کەسانێک کـە پێی بزانن و لێی تێبگەن.

(٩٨) هـەر ئـەو زاتـە ئێـوەی بەدیـهێناوە لـە تاکـە کەسـێک، سـەردەمێک (بەشـێکتانی لـە پشـتی باوکتاندا) نیشتەجێ کردبوو (کە گوێزرانـەوە بۆ نـاو سکی دایکتان) ئەو شوێنە ئێوەی گرتە خۆ (تا تیایدا نەش و نما بکەن، یاخود بۆ ماوەیەک ئێـوەی لەسـەر رووکاری زەوی دانا، دوایی لـە توێیدا شـاردنیەوە تـا رۆژی قیامـەت) بەڕاسـتی ئێمـە نیشـانە و بەڵگـەی زۆرمـان (لەسـەر دروسـتکردنی ئێـوە و دروسـتکاری خۆمـان هێناوەتـەوە) بـۆ کەسـانێک کـە تێفکـرن و ووردبین بن.

(٩٩) ئەو خوایە زاتێکە کە لە ئاسمانەوە باران دەبارێنێت (دەفـەرموێت): جا بەهۆیەوە چرۆو چەکـەرەی هـەموو شـتێکی پـێ دەردەهێنین و شینی دەکەین، ئینجا لاسکی سەوزی لێ پەیدا دەکـەین، زنـجیرە دانــەی سەفتەکـراوی لــێ دروسـت دەکــەین (وەک گـوڵـەگەنم و چەڵتوک وگـەنمەشامی.هتـد)لـە دارخورمـاش لـە هـەندی لـق و چڵـە پـۆپی هـێشووی خـورما شـۆڕ دەبێتەوە، هەروەها باخی هەمەجۆری رەزو ترێ، زەیتون و هـەناریش، هەیانـە لـە ڕواڵـەتدا لەیـەک دەچێت، هەشیانە لـەیـەک ناچێت، جا تەماشای بەرەکەی بکەن کـاتێک بەر دەگرێت، پێ دەگات، (سەرەتا هەندێکی گوڵـە و دوایـی خـۆی هـەڵدەپێچێت، رەنگ و قەبارەیەک دەگرێتە خۆی، دوای چـەند مـانگێـک قەبارەشـی گـەورەتر دەبێـت، رەنگـیشی دەگـۆڕێت، ئـەوسا پـێ دەگات و تام و بۆنی سروشتی خۆی بۆ دروست دەبێت) بەڕاستی ئا لەو شتانەدا (کە ئاماژەی تێداکـرا بۆتـان) چـەندەها بەڵگـەو نیشانەی تەواون بۆ کەسانێک کـە ئیمـان و باوەڕیـان دەهێنـن (بـەو بـەدی هێنـەرەی کـە ئـاسـەواری دەسـتـی قـودرەت و بـە دەسەڵاتـی لە هەموو شتێکدا بەدی دەکرێت).

(١٠٠) (لەگەڵ ئەو هەموو نیشانەی دەسەڵاتداریـــەدا نـــەفامان) پـەری و جنۆکـەیان کـردۆتە هـاوبـەش و هاوتـای خـوا، لـە حاڵێکدا هەر خوا دروستکاری پەری و جنۆکەکانە و بەناحەق کوڕو کچ دەدەنە پاڵـی، بـێ هیـچ جـۆرە زانیاریـەک (گـاور دەڵـێ: عیسا کوڕی خوایە، جوو دەڵێ: عوزەیر، هاوەڵگەران دەڵێن: فریشتەکان کچـی خوان!!) پـاکـی و بێگـەردی و بڵـندی بـۆ ئـەو زاتەیە کە دوورە لەو سیفەتە ناقۆڵاو نادروستانەوە کە ئەوانە خوای پێی پێناسە دەکەن.

(١٠١) بێگـومان ئـەو زاتـە بەدیهێنەری ئـاسمانەکـان و زەویـە لـە جوانـترین و رێـک و پێکـترین شـێوەدا، چـۆن رۆڵـەی دەبێت؟! خۆ ئەوزاتە هاوسەری نەگرتووە؟! بەڵکو هەموو شتێکی دروست کردوە، بەڕاستی ئەو زاتە بەهەموو شتێک زانایە.

ذَٰلِكُمُ ٱللَّهُ رَبُّكُمْ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ خَٰلِقُ كُلِّ شَيْءٍ فَٱعْبُدُوهُ وَهُوَ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ وَكِيلٌ ﴿١٠٢﴾ لَّا تُدْرِكُهُ ٱلْأَبْصَٰرُ وَهُوَ يُدْرِكُ ٱلْأَبْصَٰرَ وَهُوَ ٱللَّطِيفُ ٱلْخَبِيرُ ﴿١٠٣﴾ قَدْ جَآءَكُم بَصَآئِرُ مِن رَّبِّكُمْ فَمَنْ أَبْصَرَ فَلِنَفْسِهِۦ وَمَنْ عَمِيَ فَعَلَيْهَا وَمَآ أَنَا۠ عَلَيْكُم بِحَفِيظٍ ﴿١٠٤﴾ وَكَذَٰلِكَ نُصَرِّفُ ٱلْءَايَٰتِ وَلِيَقُولُواْ دَرَسْتَ وَلِنُبَيِّنَهُۥ لِقَوْمٍ يَعْلَمُونَ ﴿١٠٥﴾ ٱتَّبِعْ مَآ أُوحِيَ إِلَيْكَ مِن رَّبِّكَ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ وَأَعْرِضْ عَنِ ٱلْمُشْرِكِينَ ﴿١٠٦﴾ وَلَوْ شَآءَ ٱللَّهُ مَآ أَشْرَكُواْ وَمَا جَعَلْنَٰكَ عَلَيْهِمْ حَفِيظًا وَمَآ أَنتَ عَلَيْهِم بِوَكِيلٍ ﴿١٠٧﴾ وَلَا تَسُبُّواْ ٱلَّذِينَ يَدْعُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ فَيَسُبُّواْ ٱللَّهَ عَدْوًا بِغَيْرِ عِلْمٍ كَذَٰلِكَ زَيَّنَّا لِكُلِّ أُمَّةٍ عَمَلَهُمْ ثُمَّ إِلَىٰ رَبِّهِم مَّرْجِعُهُمْ فَيُنَبِّئُهُم بِمَا كَانُواْ يَعْمَلُونَ ﴿١٠٨﴾ وَأَقْسَمُواْ بِٱللَّهِ جَهْدَ أَيْمَٰنِهِمْ لَئِن جَآءَتْهُمْ ءَايَةٌ لَّيُؤْمِنُنَّ بِهَا قُلْ إِنَّمَا ٱلْءَايَٰتُ عِندَ ٱللَّهِ وَمَا يُشْعِرُكُمْ أَنَّهَآ إِذَا جَآءَتْ لَا يُؤْمِنُونَ ﴿١٠٩﴾ وَنُقَلِّبُ أَفْـِٔدَتَهُمْ وَأَبْصَٰرَهُمْ كَمَا لَمْ يُؤْمِنُواْ بِهِۦٓ أَوَّلَ مَرَّةٍ وَنَذَرُهُمْ فِي طُغْيَٰنِهِمْ يَعْمَهُونَ ﴿١١٠﴾

(١٠٢) ئا ئەو خوایە پەروەردگارتانە، جگە لەویش هیچ خوایەکی تر نیە، بەدیهێنەری هەموو شتێکە، کەواتە هەر ئەو زاتە بپەرستن و بەندایەتی تەنها ئەو بکەن، ئەو خوایە ئاگادارو چاودێری هەموو شتێکە.

(١٠٣) دەزگای بینایی و (بۆچوونی نادەمیزاد) ناتوانێت ئەو زاتە ببینێت، زانیاری ئەو خوایە هەموو شتێکی گرتۆتەوە، ئاگاداریشە بەهەموو دەزگاکانی بینایی، هەر ئەوە ووردبین و ئاگایە.

(١٠٤) بێگومان چەندەها بەڵگەی روناکبیرتان لە لایەن پەروەردگارتانەوە بۆ هاتووە، جا ئەوەی خۆی روناکبیر بکات و لە راستیەکان تێفکرێت و تێبگات و گۆڕانکاری لە بیرو هۆش و ژیانیدا ئەنجام بدات، ئەوە هەرخۆی قازانج دەکات، ئەوکەسەی چاو دەنوقێنێت لە ئاستی روناکبیریە خواییەکاندا و لەڕاستی لادەدات، ئەویش هەر لەسەر خۆی دەکەوێت و خۆی زەرەر دەکات و من (واتە پێغەمبەر ﷺ) بەهیچ شێوەیەک چاودێر نیم بەسەرتانەوە.

(١٠٥) هەر بەو شێوەیە (ئەی محمد ﷺ) ئایەتی جۆراو جۆرت بۆ ڕەوانە دەکەین لە هەموو بارەیەکەوە، دە با هەر بڵێن خوێندووتە و بەدەرس پێت وتراوە (ئێمە دەمانەوێت) بەڕاستی روونی بکەینەوە بۆ کەسانێک کە بزانن و تێبگەن.

(١٠٦) (تۆ ئەی محمد ﷺ) شوێنی ئەو بەرنامەیە بکەوە کە لەلایەن پەروەردگارتەوە بە نیگا و (وحی) پێت ڕاگەیەنراوە، جگە لەو هیچ خوایەکی تر نیە، گوێ مەدەرێ و پشت هەڵکە لە موشریک و هاوەڵگەران.

(١٠٧) خۆ ئەگەر پەروەردگارت (بیویستایە و شایستە بونایە هیدایەتی دەدان) هاوەڵگەر نەدەبوون، خۆ ئێمە تۆمان نەکردووەتە چاودێری بەسەر ئەوانەوە و تۆ دەسەڵاتت بەسەریاندا نیە(تا بەزۆر هیدایەتیان بەسەردا بسەپێنیت).

(١٠٨) (ئەی ئیمانداران) ئەکەن جوێن بدەن بەو بت و شتانەی کە(نەفامان) هاواری لێدەکەن و دەیپەرستن بێجگە لەخوا، ئەوەکو ئەوانیش بەناحەق و بەنەفامی جوێن بدەن بەخوا، (چونکە ئەوانە) نایناسن و قەدری نازانن، ئا بەو شێوەیە ئێمە بۆ هەر گەل و ئوممەتێک کردەوەکەیانمان رازاندۆتەوە، لەوەودوا گەڕانەوەیان هەر بۆ لای پەروەردگاریانە، ئەوسا ئاگاداریان دەکاتەوە بەو کاروکردەوانەی کە دەیانکرد.

(١٠٩) موشریک و هاوەڵگەران سوێندی گەورەیان بەخوا دەخوارد: کە سوێند بێت ئەگەر موعجیزەیەکیان بۆ بێت ئەوە بێگومان باوەڕی پێ دەهێنن، پێیان بڵێ: بەڕاستی هەموو بەڵگەو موعجیزەکان تەنها لای خوایە و بەدەست ئەوە، جا ئێوە چووزانن، چونکە لەوانەیە ئەو داخوازی و موعجیزە و بەڵگانەشیان بۆ پێش بهێنین هەر باوەڕ ناهێنن.

(١١٠) ئەو کاتە دڵ و چاوەکانیان هەڵدەگێرینەوە (لەنێوان جۆرەها لێکدانەوە و ئەگەردا) هەروەکو چۆن یەکەمجار لە سەرەتاوە باوەڕیان نەهێنابوو(بەدەسەڵاتی بێ سنووری خواو ئەم هەموو موعجیزە بێ شومارە کە دەوری داون) ئێمە جارێ وازیان لێ دەهێنین تا لە ستەم و سەرکەشی خۆیاندا سەرگەردان بن و ڕۆبچن (بۆ کوێ دەچن لە دەستمان دەرناچن).



۞ وَلَوْ أَنَّنَا نَزَّلْنَآ إِلَيْهِمُ ٱلْمَلَٰٓئِكَةَ وَكَلَّمَهُمُ ٱلْمَوْتَىٰ وَحَشَرْنَا عَلَيْهِمْ كُلَّ شَيْءٍ قُبُلًا مَّا كَانُوا۟ لِيُؤْمِنُوٓا۟ إِلَّآ أَن يَشَآءَ ٱللَّهُ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَهُمْ يَجْهَلُونَ ﴿١١١﴾ وَكَذَٰلِكَ جَعَلْنَا لِكُلِّ نَبِيٍّ عَدُوًّا شَيَٰطِينَ ٱلْإِنسِ وَٱلْجِنِّ يُوحِى بَعْضُهُمْ إِلَىٰ بَعْضٍ زُخْرُفَ ٱلْقَوْلِ غُرُورًا ۚ وَلَوْ شَآءَ رَبُّكَ مَا فَعَلُوهُ ۖ فَذَرْهُمْ وَمَا يَفْتَرُونَ ﴿١١٢﴾ وَلِتَصْغَىٰٓ إِلَيْهِ أَفْـِٔدَةُ ٱلَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ بِٱلْـَٔاخِرَةِ وَلِيَرْضَوْهُ وَلِيَقْتَرِفُوا۟ مَا هُم مُّقْتَرِفُونَ ﴿١١٣﴾ أَفَغَيْرَ ٱللَّهِ أَبْتَغِى حَكَمًا وَهُوَ ٱلَّذِىٓ أَنزَلَ إِلَيْكُمُ ٱلْكِتَٰبَ مُفَصَّلًا ۚ وَٱلَّذِينَ ءَاتَيْنَٰهُمُ ٱلْكِتَٰبَ يَعْلَمُونَ أَنَّهُۥ مُنَزَّلٌ مِّن رَّبِّكَ بِٱلْحَقِّ ۖ فَلَا تَكُونَنَّ مِنَ ٱلْمُمْتَرِينَ ﴿١١٤﴾ وَتَمَّتْ كَلِمَتُ رَبِّكَ صِدْقًا وَعَدْلًا ۚ لَّا مُبَدِّلَ لِكَلِمَٰتِهِۦ ۚ وَهُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْعَلِيمُ ﴿١١٥﴾ وَإِن تُطِعْ أَكْثَرَ مَن فِى ٱلْأَرْضِ يُضِلُّوكَ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ ۚ إِن يَتَّبِعُونَ إِلَّا ٱلظَّنَّ وَإِنْ هُمْ إِلَّا يَخْرُصُونَ ﴿١١٦﴾ إِنَّ رَبَّكَ هُوَ أَعْلَمُ مَن يَضِلُّ عَن سَبِيلِهِۦ ۖ وَهُوَ أَعْلَمُ بِٱلْمُهْتَدِينَ ﴿١١٧﴾ فَكُلُوا۟ مِمَّا ذُكِرَ ٱسْمُ ٱللَّهِ عَلَيْهِ إِن كُنتُم بِـَٔايَٰتِهِۦ مُؤْمِنِينَ ﴿١١٨﴾

(١١١) خۆ ئەگەر (داخوازی هاوەڵگەزانمان جێبەجێ بکردایە) و بەڕاستی ئێمە فریشتەمان دابەزاندنایە بۆ لایان و مردووەکان قسەیان لەگەڵدا بکردنایە، هەموو شتێکیشمان لەبەر دەمیاندا کۆ بکردایەتەوە، نەدەبوون بەبڕوادار و بڕوایان نەدەهێنا، مەگەر خوا بیەوێت، بەڵام زۆربەیان نافامن و نازانن (بیر ناکەنەوە و تێنافکرن، هەتا ئەمڕۆش گا پەرست و، شەیتان پەرست و، بت پەرستان هەر ماون، هەیانە خاوەنی بڕوانامەی بەرزیشن، بەڵام لە ڕووی ئاینداریەوە لەوپەڕی دواکەوتن و کۆنەپەرستیدان).

(١١٢) هەر بەو شێوەیە (کێشمە کێشی ئیمانداران و خوانەناسان بەردەوامە) جا بۆ هەموو پێغەمبەرێک (بۆ ئیماندارانیش) دوژمنێکمان لە شەیتانەکانی ئادەمیزاد و پەری سازاندوە، کە بەردەوام قسەی زل و ڕازاوە دەدەن بەگوێی یەکداو (خۆیان و خەڵکی) پێ سەرگەردان و گومڕا دەکەن، خۆ ئەگەر پەروەردگارت بیویستایە (نەیاندەتوانی) شتی وابکەن، دە وازیان لێ بهێنە لەگەڵ ئەو درۆو دەلەسەیەی کە هەڵی دەبەستن (بۆ کوێ دەچن، لە دەست سزای خوایی ڕزگار نابن).

(١١٣) (هەروەها بەو قسە جوان و بریقەدارانە ئەیاندا بەگوێی یەکدا) بۆئەوەی ئەوانەی باوەڕیان بەقیامەت نیە دڵی بدەنێ و پێی ڕازی بن و بۆ ئەوەی ئەوتاوانانە بکەن کە ئەوان بەردەوام دەیکەن.

(١١٤) ئایا ڕەوایە (بۆ منی پێغەمبەر، بۆ منی ئیماندار) جگە لە خوا کەسێکی تر بکەمە حەکەم و دادوەر، لەکاتێکدا ئەو زاتە کتێبی پیرۆزی خۆی کە (قورئانە) بۆ دابەزاندوون کە هەموو دروست و نادروستێکی تیادا جیاکردۆتەوە، ئەوانەش کە کتێبی (ئاسمانیمان) پێداون (لە گاورو جوو) چاک دەزانن بەڕاستی ئەو قورئانە لەلایەن پەروەردگارتەوە بەڕاست و ڕەوا دابەزێنراوە، کەوابوو ئیتر تۆ هەرگیز مەچۆرە ریزی گوماندارو دوو دڵانەوە.

(١١٥) فەرمان و فەرموودەکانی پەروەردگارت (ئەی محمد ﷺ) لەوپەڕی ڕاستی و دادپەروەریدا بەئەنجام گەیشتووە، هەرگیز شتێک نیە بیانگۆڕێت، هەر ئەویش بیسەرە بەگوفتاری هەمووان، زانایە بەهەموو نهێنی و ئاشکرایەک.

(١١٦) خۆ ئەگەر فەرمانبەردارو ملکەچی زۆربەی خەڵکی سەرزەوی بیت ئەوە لە ڕێبازی خوا وێڵت دەکەن، چونکە شوێنی هیچ شتێک ناکەون جگە لە گومان و تەنها گۆترەکاری دەکەن.

(١١٧) بەڕاستی پەروەردگاری تۆ چاک زانایە بەوەی کە: کێ لە ئاین و ڕێبازی ئەو وێڵ و گومڕا دەبێت و هەر خوایش زانایە بەوانەی کە هیدایەت و ڕێنموویی وەرگرن.

(١١٨) جا بخۆن لەو زیندەوەرە سەر بڕاوانەی کە ناوی خوا لەکاتی سەربڕینیاندا براوە، ئەگەر ئێوە باوەڕتان بەڕێنموونی و ئایەتەکانی خوا هەیە (**بسم الله، الله أكبر**، پێویستە لەکاتی سەربڕینی ماڵاتدا بوترێت).

وَمَا لَكُمْ أَلَّا تَأْكُلُوا مِمَّا ذُكِرَ اسْمُ اللَّهِ عَلَيْهِ وَقَدْ فَصَّلَ لَكُم مَّا حَرَّمَ عَلَيْكُمْ إِلَّا مَا اضْطُرِرْتُمْ إِلَيْهِ وَإِنَّ كَثِيرًا لَّيُضِلُّونَ بِأَهْوَائِهِم بِغَيْرِ عِلْمٍ إِنَّ رَبَّكَ هُوَ أَعْلَمُ بِالْمُعْتَدِينَ ﴿١١٩﴾ وَذَرُوا ظَاهِرَ الْإِثْمِ وَبَاطِنَهُ إِنَّ الَّذِينَ يَكْسِبُونَ الْإِثْمَ سَيُجْزَوْنَ بِمَا كَانُوا يَقْتَرِفُونَ ﴿١٢٠﴾ وَلَا تَأْكُلُوا مِمَّا لَمْ يُذْكَرِ اسْمُ اللَّهِ عَلَيْهِ وَإِنَّهُ لَفِسْقٌ وَإِنَّ الشَّيَاطِينَ لَيُوحُونَ إِلَىٰ أَوْلِيَائِهِمْ لِيُجَادِلُوكُمْ وَإِنْ أَطَعْتُمُوهُمْ إِنَّكُمْ لَمُشْرِكُونَ ﴿١٢١﴾ أَوَمَن كَانَ مَيْتًا فَأَحْيَيْنَاهُ وَجَعَلْنَا لَهُ نُورًا يَمْشِي بِهِ فِي النَّاسِ كَمَن مَّثَلُهُ فِي الظُّلُمَاتِ لَيْسَ بِخَارِجٍ مِّنْهَا كَذَٰلِكَ زُيِّنَ لِلْكَافِرِينَ مَا كَانُوا يَعْمَلُونَ ﴿١٢٢﴾ وَكَذَٰلِكَ جَعَلْنَا فِي كُلِّ قَرْيَةٍ أَكَابِرَ مُجْرِمِيهَا لِيَمْكُرُوا فِيهَا وَمَا يَمْكُرُونَ إِلَّا بِأَنفُسِهِمْ وَمَا يَشْعُرُونَ ﴿١٢٣﴾ وَإِذَا جَاءَتْهُمْ آيَةٌ قَالُوا لَن نُّؤْمِنَ حَتَّىٰ نُؤْتَىٰ مِثْلَ مَا أُوتِيَ رُسُلُ اللَّهِ اللَّهُ أَعْلَمُ حَيْثُ يَجْعَلُ رِسَالَتَهُ سَيُصِيبُ الَّذِينَ أَجْرَمُوا صَغَارٌ عِندَ اللَّهِ وَعَذَابٌ شَدِيدٌ بِمَا كَانُوا يَمْكُرُونَ ﴿١٢٤﴾

(١١٩) بەڵگەتان چیە کە(لە گۆشتی ئەو ئاژەڵانە) ناخۆن کە ناوی خوا براوە لە سەریان (لەکاتی سەر برینیاندا) لەکاتێکدا بەڕاستی ئەوەی حەرام کراوە لە سەرتان خوا بۆی جیا کردونەتەوە مەگەر ناچار بکرێن بۆی، بەڕاستی زۆربەیان خەڵکی سەرگەردان وگومڕا دەکەن بەهۆی ئارەزووەکانیانەوە نەك بەهۆی زانستەوە (هەر لەخۆیانەوە شت حەرام دەکەن) بێگومان پەروەردگارت خۆی چاك ئەو کەسانە دەناسێت کە دەست درێژکارن و خۆشیان و خەڵکیش لە سنوور دەترازێنن.

(١٢٠) (ئەی گرۆی ئیمانداران) واز بهێنن لە هەموو گوناهو هەڵەیەکی ئاشکراو نادیار (لەو گوناهانە بە دووربن کە بەدڵ و دەروون دەکرێت، هەروەها لەوانەش کە بەدەم و دەست و ئەندامەکان دەکرێت) بەڕاستی ئەوانەی گوناهو تاوان ئەنجام دەدەن لەئایندەدا سزاو تۆڵەی گوناهو تاوانەکانیان یەخەیان پێ دەگرێت.

(١٢١) لەو ئاژەڵە سەر براوانەش مەخۆن کە ناوی خوا لەکاتی سەر برینیاندا نەبراوە و بەڕاستی ئەوە لادان و گوناهە، دڵنیابن کە شەیتانەکان شت دەخەنە دڵی لایەنگرەکانیانەوە تا موجادەلەتان لەگەڵ بکەن و (بەرگری لە بەتاڵیان بکەن) جا ئەگەر ئێوە فەرمانبەرداری ئەو هاوەڵگەرو شەیتانانە بن، ئەوە بێگومان مانای وایە ئێوەش موشریك و هاوەڵگەرن.

(١٢٢) ئایا ئەو کەسەی کە مردوو بوو(بەهۆی بێ باوەڕیەوە)، ئینجا (بەهۆی ئیمانەوە) زیندوومان کردەوە و نوورو روناکیەکمان بۆ ساز کرد لە ژیانیدا (کە قورئانە) لەناو خەڵکیدا پێی دەڕوات و هەڵس و کەوتی پێدەکات (هاندەرێتی بۆ هەموو چاکەیەك و دەیگێڕێتەوە لە هەموو خراپەیەك، ئایا ئەو کەسە) وەکو ئەوە وایە کە لەناو تاریکیەکاندا گیری خواردوە و لیێ دەرناچێت، هەروەها ئا بەو شێوەیە کە دەبینرێت ئەو کارو کردەوەی کە دەیکەن بۆیان رازێنراوەتەوە.

(١٢٣) ئا بەو شێوەیە، لەناو هەموو شارو شارۆچکەیەکدا گەورەترینی تاوانباریانمان بالادەست کردوە تا پیلان و تەڵەکە بگێڕن تیایدا، (بێ ئەوەی بزانن) کە: هیچ فێڵ و تەڵەکەیەکیش ناکەن بەزیانی خۆیان تەواو نەبێت، لەکاتێکدا هەست بەوە ناکەن، پیلان دژی خۆیان دەگێڕن و بەسەر خۆیاندا دەشکێتەوە (بەلام) هەستی پێناکەن (چونکە غافڵ و بێ ئاگان کە بەرەو لێواری مەرگ هەنگاو هەڵدەگرن و لە سزای پەروەردگار دەرباز نابن).

(١٢٤) (بێ باوەڕان) کاتێك ئایەتێکی قورئانیان بۆ بێت دەڵێن: ئێمە هەرگیز باوەڕ ناهێنین هەتا وێنەی ئەوەی کە بۆ پێغەمبەران هاتووە بە ئێمە نەبەخشرێت، خوا زانایە بەو شوێن و دڵ و دەروونەی کە شایستەیە پەیامی خۆی تێدا دابنێت، لەئایندەیەکی نزیکیشدا ئەوانەی کە تاوانیان کردووە لەلایەن خواوە سووکی و ریسوای و بێ نرخی یەخەیان پێدەگرێت، هاوڕێ لەگەڵ سزای پڕ ئێشدا لە پاداشتی ئەو پیلان و تەڵەکەیەدا کە دەیانگێڕا.

فَمَن يُرِدِ ٱللَّهُ أَن يَهْدِيَهُۥ يَشْرَحْ صَدْرَهُۥ لِلْإِسْلَـٰمِ ۖ وَمَن يُرِدْ أَن يُضِلَّهُۥ يَجْعَلْ صَدْرَهُۥ ضَيِّقًا حَرَجًا كَأَنَّمَا يَصَّعَّدُ فِى ٱلسَّمَآءِ ۚ كَذَٰلِكَ يَجْعَلُ ٱللَّهُ ٱلرِّجْسَ عَلَى ٱلَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ ﴿١٢٥﴾ وَهَـٰذَا صِرَٰطُ رَبِّكَ مُسْتَقِيمًا ۗ قَدْ فَصَّلْنَا ٱلْـَٔايَـٰتِ لِقَوْمٍ يَذَّكَّرُونَ ﴿١٢٦﴾ ۞ لَهُمْ دَارُ ٱلسَّلَـٰمِ عِندَ رَبِّهِمْ ۖ وَهُوَ وَلِيُّهُم بِمَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴿١٢٧﴾ وَيَوْمَ يَحْشُرُهُمْ جَمِيعًا يَـٰمَعْشَرَ ٱلْجِنِّ قَدِ ٱسْتَكْثَرْتُم مِّنَ ٱلْإِنسِ ۖ وَقَالَ أَوْلِيَآؤُهُم مِّنَ ٱلْإِنسِ رَبَّنَا ٱسْتَمْتَعَ بَعْضُنَا بِبَعْضٍ وَبَلَغْنَآ أَجَلَنَا ٱلَّذِىٓ أَجَّلْتَ لَنَا ۚ قَالَ ٱلنَّارُ مَثْوَىٰكُمْ خَـٰلِدِينَ فِيهَآ إِلَّا مَا شَآءَ ٱللَّهُ ۗ إِنَّ رَبَّكَ حَكِيمٌ عَلِيمٌ ﴿١٢٨﴾ وَكَذَٰلِكَ نُوَلِّى بَعْضَ ٱلظَّـٰلِمِينَ بَعْضًۢا بِمَا كَانُوا۟ يَكْسِبُونَ ﴿١٢٩﴾ يَـٰمَعْشَرَ ٱلْجِنِّ وَٱلْإِنسِ أَلَمْ يَأْتِكُمْ رُسُلٌ مِّنكُمْ يَقُصُّونَ عَلَيْكُمْ ءَايَـٰتِى وَيُنذِرُونَكُمْ لِقَآءَ يَوْمِكُمْ هَـٰذَا ۚ قَالُوا۟ شَهِدْنَا عَلَىٰٓ أَنفُسِنَا ۖ وَغَرَّتْهُمُ ٱلْحَيَوٰةُ ٱلدُّنْيَا وَشَهِدُوا۟ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمْ أَنَّهُمْ كَانُوا۟ كَـٰفِرِينَ ﴿١٣٠﴾ ذَٰلِكَ أَن لَّمْ يَكُن رَّبُّكَ مُهْلِكَ ٱلْقُرَىٰ بِظُلْمٍ وَأَهْلُهَا غَـٰفِلُونَ ﴿١٣١﴾



(١٢٥) جا ئەو کەسەی (خێری تێدا بێت) و خوا بیەوێت هیدایەتی بدات، ئەوە سینەی ساف و پاك و ئامادە دەکات بۆ ئاینی ئیسلام، ئەو کەسەش خوا بیەوێت گومرای بکات، ئەوە دڵی دەگوشێت و سنگی توند دەکات و هەناسەی سوار دەبێت، هەر وەك ئەوەی بەرەو ئاسمان بەرز بێتەوە (چۆن تووشی تەنگە نەفەسی و دڵە تەپێ و خوێن بەر بوون دەبێت)، تا بەو شێوەیە خوا گومڕایی و پیسی هاوەڵگەری لەسەر دڵی ئەوانە دادەنێت کە باوەڕ ناهێنن.

(١٢٦) ئا ئەم قورئانە ڕێگەو ڕێبازو بەرنامەی پەروەردگاری تۆیە کە ڕاست و دروستە، بێگومان ئێمە هەموو بەڵگە و فەرمانەکانمان روون کردۆتەوە بۆ کەسانێك کە یاداوەری وەردەگرن.

(١٢٧) ئەوانە بەهەشتی پڕ لە ئاشتی و هێمنیان بۆ ئامادەیە لای پەروەردگاریان، هەر ئەو زاتەش پشتیوان و خۆشەویستیانە بەهۆی ئەو کارو کردەوە چاکانەی کە ئەنجامیان دەدا.

(١٢٨) ڕۆژێك دێت خوا هەموانیان کۆ دەکاتەوە و (بەخەشم و قینەوە دەفەرموێت): ئەی دەستەی پەریەکان بەڕاستی ئێوە زۆر کەستان لە ئینسانەکان گومڕاکرد، لەولاشەوە گوێ لە مشتەکانیان، (لە خەڵکی نەگبەت و رەنجەڕۆ) دەڵێن: پەروەردگارا هەندێکمان سوودمان لە هەندێکیان وەرگرت (سوودی ئینسانەکان ڕابواردن سامان کۆکردنەوە بوو، سوودی پەریەکانیش پێڕی خۆیانیان زۆرکرد بەگومڕاکردنی خەڵکێکی زۆر)، ئێستاش ئەوەتە گەیشتووینەتە ئەوکات و ساتەی تۆ بۆت دیاری کردووین، خوایش فەرمووی: (مادەم وایە) ئەم ئاگرە جێگەتانە ئەمرن تیادا، مەگەر خوا ویستی لەسەر بێت (بە سزایەکی تر سزایان بدات)، بەڕاستی پەروەردگاری تۆ (ئەی محمد ﷺ ئەی ئیماندار) داناو زانایە.

(١٢٩) هەر بەو شێوەیەش ستەمکاران دەکەینە پشتیوان و خۆشەویست و هاوکاری یەکتر، بەهۆی ئەو کارو کردەوانەی کە دەیانکرد.

(١٣٠) (لە رۆژی قیامەتدا خوا دەفەرموێت): ئەی دەستەی پەری و ئینسان، ئایا پێغەمبەرانتان لە خۆتان بۆ نەهات، کە ئایەتەکانی من و ڕووداوەکان بەسەرتاندا بخوێننەوە و ئاگادارتان بکەن و بتانترسێنن لەوەی کە ئەم ڕۆژەتان بۆ پێش دێت؟! (هەموو بەیەکدەنگ) دەڵێن: ڕاستە، ئێمە خۆمان شایەتی لەسەر خۆمان دەدەین (بەڵام ئەوانە کاتی خۆی) ژیانی دنیا سەری لێشێواندن و هەڵی خەڵەتاندن و شایەتیان لەسەر خۆیاندا کە بەڕاستی کاتی خۆی بێ باوەڕ بوون.

(١٣١) ئەو ناردنی پێغەمبەرانە بۆ ئەوەیە چونکە پەروەردگاری تۆ (نەیکردووە بەعادەت) کە لەناوبەری شارو شوێنەکان بێت بە ناحەق، لەکاتێکدا خەڵکەکەی غافڵ و بێ ئاگا بن و پەیامی خوایان پێ ڕانەگەیەنرابێت.

وَلِكُلٍّ دَرَجَٰتٌ مِّمَّا عَمِلُواْ وَمَا رَبُّكَ بِغَٰفِلٍ عَمَّا يَعۡمَلُونَ ﴿١٣٢﴾ وَرَبُّكَ ٱلۡغَنِيُّ ذُو ٱلرَّحۡمَةِ إِن يَشَأۡ يُذۡهِبۡكُمۡ وَيَسۡتَخۡلِفۡ مِنۢ بَعۡدِكُم مَّا يَشَآءُ كَمَآ أَنشَأَكُم مِّن ذُرِّيَّةِ قَوۡمٍ ءَاخَرِينَ ﴿١٣٣﴾ إِنَّ مَا تُوعَدُونَ لَأٓتٍ وَمَآ أَنتُم بِمُعۡجِزِينَ ﴿١٣٤﴾ قُلۡ يَٰقَوۡمِ ٱعۡمَلُواْ عَلَىٰ مَكَانَتِكُمۡ إِنِّي عَامِلٌ فَسَوۡفَ تَعۡلَمُونَ مَن تَكُونُ لَهُۥ عَٰقِبَةُ ٱلدَّارِ إِنَّهُۥ لَا يُفۡلِحُ ٱلظَّٰلِمُونَ ﴿١٣٥﴾ وَجَعَلُواْ لِلَّهِ مِمَّا ذَرَأَ مِنَ ٱلۡحَرۡثِ وَٱلۡأَنۡعَٰمِ نَصِيبًا فَقَالُواْ هَٰذَا لِلَّهِ بِزَعۡمِهِمۡ وَهَٰذَا لِشُرَكَآئِنَا فَمَا كَانَ لِشُرَكَآئِهِمۡ فَلَا يَصِلُ إِلَى ٱللَّهِ وَمَا كَانَ لِلَّهِ فَهُوَ يَصِلُ إِلَىٰ شُرَكَآئِهِمۡ سَآءَ مَا يَحۡكُمُونَ ﴿١٣٦﴾ وَكَذَٰلِكَ زَيَّنَ لِكَثِيرٍ مِّنَ ٱلۡمُشۡرِكِينَ قَتۡلَ أَوۡلَٰدِهِمۡ شُرَكَآؤُهُمۡ لِيُرۡدُوهُمۡ وَلِيَلۡبِسُواْ عَلَيۡهِمۡ دِينَهُمۡ وَلَوۡ شَآءَ ٱللَّهُ مَا فَعَلُوهُ فَذَرۡهُمۡ وَمَا يَفۡتَرُونَ ﴿١٣٧﴾

(١٣٢) بۆ هەر یەکێك لە بێ باوەڕ و موسڵمان چەندەها پلەوپایە هەیە لە پاداشتی کردەوەکانی، پەروەردگاریشت بێئاگا نیە لەو کاروکردەوەی کە دەیکەن.

(١٣٣) پەروەردگاری تۆ زۆر دەوڵەمەندو بێ نیازە، هەروەها خاوەنی سۆزو میهرەبانیشە، ئەگەر بیەوێت ئەوە ئێوە لادەبات و لەناوتان دەبات، هەرچی و هەر کەسیشی مەبەست بێت دوای ئێوە جێنشینی دەکات، هەر وەکو ئێوەی لە نەوەی کەسانێکی تر هێنایە کایەوە.

(١٣٤) بەڕاستی ئەو بەڵێنانەی کە دەتاندرێتێ (دەربارەی قیامەت و لێپرسینەوە) بەڕێوەیە و بێگومان هەر دێت و ئێوە دەسەوسانکەرنین.

(١٣٥) (ئەی محمد ﷺ پێیان) بڵێ: ئەی قەوم و هۆزم چیتان بۆ دەکرێت ئەنجامی بدەن لەسەر شێوازی خۆتان، ئەوە بەڕاستی منیش بەردەوامم لەسەر کاری خۆم (لە هەوڵ و تێکۆشان بۆ هیدایەت و ئیمان)، چونکە لەئاییندەدا دەزانن کە سەرئەنجامی ماڵی قیامەت بۆ کێ دەبێت، دڵنیاش بن کە ستەمکاران سەرفراز نابن

(١٣٦) (ئەو هاوەڵگەرو نەفامانە) هەندێك لەوەی کە خوا دروستی کردووە لە بەرو بوومی کشتوکاڵ و ماڵاتیان کردووە بە بەشی خواو وتویانە: ئەمە بەشی خوایە بەخەیاڵی خۆیان! (هەندێکی تریشیان جیا کردۆتەوە و وتویانە) ئەمەش بۆ بتەکانمانە! جا ئەوەی بۆ بتەکانیان بڕیاریان داوە ئەوە بەخوا ناگات، (واتە قبوڵ و پەسەند نیە، ئەوەش کە بەخەیاڵی ئەوان) بۆ خوا بڕیاریانداوە، ئەوە دەگەیشتە لای بتەکان و بۆ ئەوان بوو، ئای کە دادوەریەکی خراپ و نادروست دەکەن.

(١٣٧) وەك ئەو دابەشکردنە دوور لە دادوەریە، بت و پەرستراوەکانیان کوشتنی منداڵەکانیان بۆ زۆربەی هاوەڵگەران جوان و رازاوە کردبوو (نەفامانی عەرەب کچانیان زیندە بەچاڵ دەکرد)، بۆ ئەوەی لەناویان بەرن و ئاینی یەکتاپەرستیان لێ بشێوێنن، خۆ ئەگەر خوا بیویستایە ئەوە نەیاندەتوانی کاری وابکەن (ئازادی لێ دەسەندنەوە)، کەوابوو وازیان لێ بهێنە خۆیان و ئەو درۆو دەلەسەیەی کە دەیکەن.

وَقَالُواْ هَٰذِهِۦٓ أَنْعَٰمٌ وَحَرْثٌ حِجْرٌ لَّا يَطْعَمُهَآ إِلَّا مَن نَّشَآءُ بِزَعْمِهِمْ وَأَنْعَٰمٌ حُرِّمَتْ ظُهُورُهَا وَأَنْعَٰمٌ لَّا يَذْكُرُونَ ٱسْمَ ٱللَّهِ عَلَيْهَا ٱفْتِرَآءً عَلَيْهِ ۚ سَيَجْزِيهِم بِمَا كَانُواْ يَفْتَرُونَ ﴿١٣٨﴾ وَقَالُواْ مَا فِى بُطُونِ هَٰذِهِ ٱلْأَنْعَٰمِ خَالِصَةٌ لِّذُكُورِنَا وَمُحَرَّمٌ عَلَىٰٓ أَزْوَٰجِنَا ۖ وَإِن يَكُن مَّيْتَةً فَهُمْ فِيهِ شُرَكَآءُ ۚ سَيَجْزِيهِمْ وَصْفَهُمْ ۚ إِنَّهُۥ حَكِيمٌ عَلِيمٌ ﴿١٣٩﴾ قَدْ خَسِرَ ٱلَّذِينَ قَتَلُوٓاْ أَوْلَٰدَهُمْ سَفَهًۢا بِغَيْرِ عِلْمٍ وَحَرَّمُواْ مَا رَزَقَهُمُ ٱللَّهُ ٱفْتِرَآءً عَلَى ٱللَّهِ ۚ قَدْ ضَلُّواْ وَمَا كَانُواْ مُهْتَدِينَ ﴿١٤٠﴾ ۞ وَهُوَ ٱلَّذِىٓ أَنشَأَ جَنَّٰتٍ مَّعْرُوشَٰتٍ وَغَيْرَ مَعْرُوشَٰتٍ وَٱلنَّخْلَ وَٱلزَّرْعَ مُخْتَلِفًا أُكُلُهُۥ وَٱلزَّيْتُونَ وَٱلرُّمَّانَ مُتَشَٰبِهًا وَغَيْرَ مُتَشَٰبِهٍ ۚ كُلُواْ مِن ثَمَرِهِۦٓ إِذَآ أَثْمَرَ وَءَاتُواْ حَقَّهُۥ يَوْمَ حَصَادِهِۦ ۖ وَلَا تُسْرِفُوٓاْ ۚ إِنَّهُۥ لَا يُحِبُّ ٱلْمُسْرِفِينَ ﴿١٤١﴾ وَمِنَ ٱلْأَنْعَٰمِ حَمُولَةً وَفَرْشًا ۚ كُلُواْ مِمَّا رَزَقَكُمُ ٱللَّهُ وَلَا تَتَّبِعُواْ خُطُوَٰتِ ٱلشَّيْطَٰنِ ۚ إِنَّهُۥ لَكُمْ عَدُوٌّ مُّبِينٌ ﴿١٤٢﴾



(١٣٨) هاوەڵگەران بە بڕیاری نادروستی خۆیـان دەیـانوت: ئەمانـە چـەند مـالات و کێڵگەیـەکن قەدەغە کراون، کەس لێیان ناخوات مەگەر ئێمـە بمانەوێت و رازی بین، هـەندێکی مـالاتی تریـش حەرام کرابوو پشتیان بۆ سواریی و بۆبـار بـەکار بـهێنرێت، مـالاتێکی تریـش هـەن نـاوی خـوای لەسەر نابەن (ناوی بتـەکان دەبـەن لـەکاتی سـەر بڕینیاندا) ئـەم کارەیـان درۆ هەڵبەسـتن بـوو بـە دەم خواوە (گوایە بەو کارەیان رازیە)، بێگومـان خوا لە ئاییندەدا تۆڵەی هەموو ئەو شـتانەیان لـێ دەستێنێت کە بەناحەق هەڵیاندەبەست.

(١٣٩) (نەفامیـەکی تـر کـە پـەیڕەوی دەکـەن ئەوەیـە) دەیـانوت: هـەرچی لـە سـکی ئـەم مالاتانەدا بێت (لە بەچکە و کۆرپەلە) تایبەتیـە بۆ نێرینەکانمان و حەرامکراوە لە هاوسـەرانمان، خۆ ئەگەر بە مردارەوە بوویی (بەچکەیەک یان کۆرپەلەیەک بوو) ئەوا هەمووان تیایدا هاوبەشن و (پیاوان و ئافرەتان لێـی دەخـۆن) لـە ئـاییندەدا خوا پاداشتی ئەم هەموو (سنوورە خۆ کردانە و) باس و خـواس و پێناسـانەیان دەداتـەوە، چونکـە بەڕاستی خوا حەکیم و داناو کاربەجێیـە و زانـا و ئاگادارە بەهەموو شتێک (دەیەوێت هەموو هەڵسوکەوتی خەڵکی رێک و پێک بێت).

(١٤٠) بەڕاستی ئەوانەی کە منداڵەکانی خۆیان بەناحەق و نارەواو نەزانی و نەفامی کوشت زەرەریان کـرد، هـەروەها زەرەریان کرد ئەوانەی ئەوەی خوا پێی بەخشیبوون خۆیانیان لـێ بێ بەش کردو لـەناویان بـرد، هەمووشـی بـەهۆی درۆ هەڵبەستنەوە بەدەم خواوە، بەڕاستی ئەوانە گومڕا بوون و هیدایەت دراو نەبوون.

(١٤١) خوا هەر ئەو زاتەیە کە باخاتی بەرزی لق و پۆپداری بەرپا کـردوە و باخـاتی نزمـی پـەرش و بڵاویشـی بـەدی هێناوە و خورماو کشتوکاڵی جۆراو جۆریش کە شێوەو قەبارەو رەنگ و تام و بۆنیان لە خواردندا جیایە، لە زەیتـوون و هەناری لەیەک چوو، هەروەها لەیەک نەچوو، بخۆن لە بەرو بوومـەکەی کـاتێک دەیگرێـت و رۆژی چنـین و دروێنـە مـافی (هەژارانی) لێبدەن و زیادەڕەوی مەکەن، چونکە خوا لە سنوور دەرچوان و زیادەڕەوانی خۆش ناوێت.

(١٤٢) (هەر خوا) هەندێک لە مالاتی بۆ ئێوە رام هێناوە کە بۆ بـار بـردن بـەکاریان دەهێنـن (لـە خـوری و مـووی هەندێکی تریان) فەرش و رایەخ دروست دەکەن و بۆ سواریش هەندێکی تریـان بـەکار دەهێنـن، دە بخـۆن لـەو رزق و رۆزییەی کە خوا پێی بەخشیوون، نەکەن شوێن هەنگاو و (نەخشە و پیلانەکانی) شەیتان بکەون، چونکە بەڕاستی ئـەو دوژمنێکی ئاشکرای ئێوەیە.

ثَمَٰنِيَةَ أَزْوَٰجٍ مِّنَ ٱلضَّأْنِ ٱثْنَيْنِ وَمِنَ ٱلْمَعْزِ ٱثْنَيْنِ قُلْ ءَآلذَّكَرَيْنِ حَرَّمَ أَمِ ٱلْأُنثَيَيْنِ أَمَّا ٱشْتَمَلَتْ عَلَيْهِ أَرْحَامُ ٱلْأُنثَيَيْنِ نَبِّـُٔونِى بِعِلْمٍ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ ﴿١٤٣﴾ وَمِنَ ٱلْإِبِلِ ٱثْنَيْنِ وَمِنَ ٱلْبَقَرِ ٱثْنَيْنِ قُلْ ءَآلذَّكَرَيْنِ حَرَّمَ أَمِ ٱلْأُنثَيَيْنِ أَمَّا ٱشْتَمَلَتْ عَلَيْهِ أَرْحَامُ ٱلْأُنثَيَيْنِ أَمْ كُنتُمْ شُهَدَآءَ إِذْ وَصَّىٰكُمُ ٱللَّهُ بِهَٰذَا فَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّنِ ٱفْتَرَىٰ عَلَى ٱللَّهِ كَذِبًا لِّيُضِلَّ ٱلنَّاسَ بِغَيْرِ عِلْمٍ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَهْدِى ٱلْقَوْمَ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿١٤٤﴾ قُل لَّآ أَجِدُ فِى مَآ أُوحِىَ إِلَىَّ مُحَرَّمًا عَلَىٰ طَاعِمٍ يَطْعَمُهُۥٓ إِلَّآ أَن يَكُونَ مَيْتَةً أَوْ دَمًا مَّسْفُوحًا أَوْ لَحْمَ خِنزِيرٍ فَإِنَّهُۥ رِجْسٌ أَوْ فِسْقًا أُهِلَّ لِغَيْرِ ٱللَّهِ بِهِۦ فَمَنِ ٱضْطُرَّ غَيْرَ بَاغٍ وَلَا عَادٍ فَإِنَّ رَبَّكَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿١٤٥﴾ وَعَلَى ٱلَّذِينَ هَادُوا۟ حَرَّمْنَا كُلَّ ذِى ظُفُرٍ وَمِنَ ٱلْبَقَرِ وَٱلْغَنَمِ حَرَّمْنَا عَلَيْهِمْ شُحُومَهُمَآ إِلَّا مَا حَمَلَتْ ظُهُورُهُمَآ أَوِ ٱلْحَوَايَآ أَوْ مَا ٱخْتَلَطَ بِعَظْمٍ ذَٰلِكَ جَزَيْنَٰهُم بِبَغْيِهِمْ وَإِنَّا لَصَٰدِقُونَ ﴿١٤٦﴾

(١٤٣) (خوای گەورە) هەشت جووت ماڵاتی (بۆ خزمەتی نادەمیزاد دروستکردووە) لەمەڕ جوتێک و لە بزنیش جوتێک (ئەی محمد ﷺ بەو نەفامانە بڵێ کە هەر لە خۆیانەوە شت حەرام دەکەن) ئایا خواردنی گۆشتی نێرەکانی حەرام کردووە یان مێیەکان یان ئەوەی کەلە سکی مێیەکاندا هەیە؟! ئەگەر ئێوە راست دەکەن و بەڵگەیەکی زانستیتان هەیە، بۆمان روون بکەنەوە؟!

(١٤٤) هەروەها لە وشتر جووتێک و لە رەشە ووڵاخیش جوتێک، (دووبارە پێیان) بڵێ: ئایا خواردنی گۆشتی نێرەکانی حەرام کردووە یان مێیەکان، یان ئەوەی کەلە سکی مێیەکاندا هەیە؟! یاخود ئێوە (وا دیارە) شایەت بوون و لەوێ بوون کاتێک خوا بڕیاری بەو جۆرەی بۆ دان ؟!! جا ئیتر کێ لەوە ستەمکارترە کە درۆی بە دەم خواوە هەڵبەستووە تا بەبێ زانستی، خەڵکی سەر لێشێواو بکات، بەڕاستی خوا هیدایەتی دەستەی ستەمکاران نادات.

(١٤٥) (ئەی محمد ﷺ) پێیان بڵێ: من نابینم و دەستم ناکەوێت لەوەی کە وەحی و نیگام بۆ کراوە هیچ خواردنێکی حەرامکراو لەسەر ئەو کەسەی کە بیخوات، مەگەر خواردنی مردارەوە بوو، یان خوێنێکی رژێنراو، یان گۆشتی بەراز، بەڕاستی ئەو قەدەغە کراوە هەر پیسە، یاخود (ماڵاتێک) کەلە سنووری شەرع دەرچووبێت لە سەر بڕینەکەیدا بەوەی کە ناوی غەیری خوای لەسەر برابێت، جا کەسێک ئەگەر ناچارکرا (بەهۆی گرانی یان زۆر لێکردن) لەکاتێکدا داواکارو دەرچوو نەبێت و بەردەوام نەبێت و دووبارەی نەکاتەوە، ئەوە بەڕاستی پەروەردگاری تۆ لێخۆشبوو میهرەبانە (بۆ بڕوادارانی ناچار).

(١٤٦) لەسەر ئەوانەش کە بوونەتە جولەکە هەرچی زیندەوەری چڕنوکدارە حەرامان کردو لە(گۆشتی) رەشە ووڵاخ و لە بزن و مەڕیش پیوەکەمان لێ حەرام کردن مەگەر ئەوەی کە بەبڕبڕاگەی پشتیانەوە بێت، یاخود ئەوەی دەوری ریخۆڵەیانی دابێت، یان ئەوەی تێکەڵی ئێسقان بووبێت ، ئەو (حەرام کردنانە) بەهۆی لادان و ستەمیانەوە، تۆڵەیەک بوو لێمانسەندن، بەڕاستی هەر ئێمە راستگۆین (تا جولەکە خۆیان بناسن و بزانن کە ئەم قورئانە فەرموودەی خوایە و ئاگادارە بەهەموو شتێکیان).

فَإِن كَذَّبُوكَ فَقُل رَّبُّكُمْ ذُو رَحْمَةٍ وَٰسِعَةٍ وَلَا يُرَدُّ
بَأْسُهُۥ عَنِ ٱلْقَوْمِ ٱلْمُجْرِمِينَ ﴿١٤٧﴾ سَيَقُولُ ٱلَّذِينَ أَشْرَكُوا۟
لَوْ شَآءَ ٱللَّهُ مَآ أَشْرَكْنَا وَلَآ ءَابَآؤُنَا وَلَا حَرَّمْنَا مِن شَىْءٍ
كَذَٰلِكَ كَذَّبَ ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ حَتَّىٰ ذَاقُوا۟ بَأْسَنَا
قُلْ هَلْ عِندَكُم مِّنْ عِلْمٍ فَتُخْرِجُوهُ لَنَآ إِن تَتَّبِعُونَ إِلَّا
ٱلظَّنَّ وَإِنْ أَنتُمْ إِلَّا تَخْرُصُونَ ﴿١٤٨﴾ قُلْ فَلِلَّهِ ٱلْحُجَّةُ ٱلْبَٰلِغَةُ
فَلَوْ شَآءَ لَهَدَىٰكُمْ أَجْمَعِينَ ﴿١٤٩﴾ قُلْ هَلُمَّ شُهَدَآءَكُمُ ٱلَّذِينَ
يَشْهَدُونَ أَنَّ ٱللَّهَ حَرَّمَ هَٰذَا فَإِن شَهِدُوا۟ فَلَا تَشْهَدْ
مَعَهُمْ وَلَا تَتَّبِعْ أَهْوَآءَ ٱلَّذِينَ كَذَّبُوا۟ بِـَٔايَٰتِنَا وَٱلَّذِينَ
لَا يُؤْمِنُونَ بِٱلْءَاخِرَةِ وَهُم بِرَبِّهِمْ يَعْدِلُونَ ﴿١٥٠﴾ قُلْ
تَعَالَوْا۟ أَتْلُ مَا حَرَّمَ رَبُّكُمْ عَلَيْكُمْ أَلَّا تُشْرِكُوا۟ بِهِۦ
شَيْـًٔا وَبِٱلْوَٰلِدَيْنِ إِحْسَٰنًا وَلَا تَقْتُلُوٓا۟ أَوْلَٰدَكُم مِّنْ
إِمْلَٰقٍ نَّحْنُ نَرْزُقُكُمْ وَإِيَّاهُمْ وَلَا تَقْرَبُوا۟ ٱلْفَوَٰحِشَ
مَا ظَهَرَ مِنْهَا وَمَا بَطَنَ وَلَا تَقْتُلُوا۟ ٱلنَّفْسَ ٱلَّتِى
حَرَّمَ ٱللَّهُ إِلَّا بِٱلْحَقِّ ذَٰلِكُمْ وَصَّىٰكُم بِهِۦ لَعَلَّكُمْ تَعْقِلُونَ ﴿١٥١﴾



(١٤٧) ئەی پێغەمبەر ﷺ جا ئەگەر باوەڕیان پێ نەکردیت ئەوە بڵێ: کە پەروەردگارتان خاوەنی رەحمەت و میهرەبانی فراوان و بێ سنوورە (ئەگەر باوەڕ بهێنن و لەپیلان و تەڵەکە بە دوور بن، لێتان خۆش دەبێت) هێزی خەشمی خوا لە دەستەی ستەمکاران بەرگری ناکرێت (لە دەرئەنجامی بێ باوەڕیان).

(١٤٨) لەمەودوا موشریک و هاوەڵگەران دەڵێن: ئەگەر خوا بیویستایە هاوەڵمان بۆ بڕیار نەدەدا!! باوو باپیرانیشمان موشریک نەدەبوون!! هیچ شتێکیشمان لە خۆمان حەرام نەدەکرد!! (ئەمانە هەمووی قسەی بەتاڵە و هەرگیز خوای گەورە زۆر لە کەس ناکات بۆ باوەڕ هێنان یان بێ باوەڕی) هەر بەو شێوەیە ئەوانەی پێش ئەمانیش درۆ و بوختانیان هەڵدەبست، هەتا تووشی بەڵای ئێمە بوون و سزای ئێمەیان چەشت، پێیان بڵێ: ئایا هیچ زانیاری و زانستیەکی خوایتان لەلایە، تا نیشانمان بدەن و بۆمان دەربخەن؟ ئێوە شوێنی هیچ شتێکی تر ناکەون جگە لەگومان و ئێوە هیچ شتێک تر ناکەن مەگەر ئەوە نەبێت کە درۆ دەکەن.

(١٤٩) ئەی پێغەمبەر ﷺ پێیان بڵێ: کەوابوو هەر بۆ خوایە خۆی بەڵگە تێرو تەواوەکان، جا ئەگەر بیویستایە ئەوە هەمووتانی بەتەواوی هیدایەت دەداو بە ناچاریی هەمووان بروادار دەبوون (بەڵام رێزی لێگرتوون و سەرپشکی کردوون).

(١٥٠) پێیان بڵێ: ئادەی ئەو شایەتانەتان بهێنن کە شایەتی دەدەن بەراستی خوا ئەم شتانەی حەرام کردووە، خۆ ئەگەر ویستیان شایەتی بدەن، ئەوە تۆ لەگەڵ ئەواندا مەبە و شوێنی ئارەزووی ئەوانە مەکەوە کە باوەڕیان بە ئایەت و فەرمانەکانی ئێمە نەکردووە و شوێن ئارەزووی ئەوانەش مەکەوە کە باوەڕ بەرۆژی دوایی ناهێنن و ئەوانەش کە هاوتا بۆ پەروەردگاریان دادەنێن.

(١٥١) (ئەی محمد ﷺ) پێیان بڵێ: (خەڵکینە) وەرن با ئەو شتانەتان بۆ بخوێنمەوە کە پەروەردگارتان حەرامی کردووە لەسەرتان، (یەکەمیان ئەوەیە) کە هیچ شتێک نەکەن بەشەریک و هاوەڵ بۆی، (دووهەمیان ئەوەیە) کە چاک رەفتار بن لەگەڵ دایک و باوکتاندا، (سێهەمیان) منداڵانی خۆتان لەبەر برسێتی و نەداری مەکوژن، چونکە ئێمە (بەکتان ناخەین) رزق و رۆزی ئێوەش و ئەوانیش دەدەین، (چوارهەمیان) نزیکی گوناهو تاوانەکان مەکەون، چ ئەوەی کە ئاشکراو بووە و چ ئەوەی کە شاراوە و پەنهانە بووە، (پێنجەمیان) هیچ کەسیش مەکوژن کە خوا حەرامی کردووە مەگەر بەحەق نەبێت، ئەوەی کە خوێندمەوە بۆتان خوا فەرمانی پێکردوون بۆ ئەوەی ژیرو هۆشمەند بن.

وَلَا تَقْرَبُوا۟ مَالَ ٱلْيَتِيمِ إِلَّا بِٱلَّتِى هِىَ أَحْسَنُ حَتَّىٰ يَبْلُغَ أَشُدَّهُۥ ۖ وَأَوْفُوا۟ ٱلْكَيْلَ وَٱلْمِيزَانَ بِٱلْقِسْطِ ۖ لَا نُكَلِّفُ نَفْسًا إِلَّا وُسْعَهَا ۖ وَإِذَا قُلْتُمْ فَٱعْدِلُوا۟ وَلَوْ كَانَ ذَا قُرْبَىٰ ۖ وَبِعَهْدِ ٱللَّهِ أَوْفُوا۟ ۚ ذَٰلِكُمْ وَصَّىٰكُم بِهِۦ لَعَلَّكُمْ تَذَكَّرُونَ ﴿١٥٢﴾ وَأَنَّ هَٰذَا صِرَٰطِى مُسْتَقِيمًا فَٱتَّبِعُوهُ ۖ وَلَا تَتَّبِعُوا۟ ٱلسُّبُلَ فَتَفَرَّقَ بِكُمْ عَن سَبِيلِهِۦ ۚ ذَٰلِكُمْ وَصَّىٰكُم بِهِۦ لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ ﴿١٥٣﴾ ثُمَّ ءَاتَيْنَا مُوسَى ٱلْكِتَٰبَ تَمَامًا عَلَى ٱلَّذِىٓ أَحْسَنَ وَتَفْصِيلًا لِّكُلِّ شَىْءٍ وَهُدًى وَرَحْمَةً لَّعَلَّهُم بِلِقَآءِ رَبِّهِمْ يُؤْمِنُونَ ﴿١٥٤﴾ وَهَٰذَا كِتَٰبٌ أَنزَلْنَٰهُ مُبَارَكٌ فَٱتَّبِعُوهُ وَٱتَّقُوا۟ لَعَلَّكُمْ تُرْحَمُونَ ﴿١٥٥﴾ أَن تَقُولُوٓا۟ إِنَّمَآ أُنزِلَ ٱلْكِتَٰبُ عَلَىٰ طَآئِفَتَيْنِ مِن قَبْلِنَا وَإِن كُنَّا عَن دِرَاسَتِهِمْ لَغَٰفِلِينَ ﴿١٥٦﴾ أَوْ تَقُولُوا۟ لَوْ أَنَّآ أُنزِلَ عَلَيْنَا ٱلْكِتَٰبُ لَكُنَّآ أَهْدَىٰ مِنْهُمْ ۚ فَقَدْ جَآءَكُم بَيِّنَةٌ مِّن رَّبِّكُمْ وَهُدًى وَرَحْمَةٌ ۚ فَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّن كَذَّبَ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ وَصَدَفَ عَنْهَا ۗ سَنَجْزِى ٱلَّذِينَ يَصْدِفُونَ عَنْ ءَايَٰتِنَا سُوٓءَ ٱلْعَذَابِ بِمَا كَانُوا۟ يَصْدِفُونَ ﴿١٥٧﴾

(١٥٢) (شەشەمیان) نزیک ماڵ و سامانی هەتیو مەکەون مەگەر بەچاکی و لە قازانجی نەبێت، هەتا ئەو کاتەی گەورە دەبێت و بەتەواوی پێی دەگات، (حەوتەمیان) کێشان و پێوان بەرێک و پێکی بەکار بهێنن بەدادگەری ئەنجامی بدەن و (فێڵی تێدا مەکەن)، جا ئێمە داخوازی لە کەس ناکەین مەگەر بەگوێرەی توانای خۆی نەبێت (هەشتەمیان) کاتێکیش قسەو گوفتارتان کرد ئەوە دادوەر بن و (لایەنی ناحەق مەگرن) ئەگەر خزمی نزیکیش بێت، (نۆهەمیان) وەفابکەن بەو پەیمانەی کە دەیبەستن لەگەڵ خوادا و بەو بەڵێنەی کە بە پەروەردگاری دەدەن، ئەو شتانەش پەروەردگارتان فەرمانی پێداون، بۆ ئەوەی یادەوەری وەربگرن.

(١٥٣) بێگومان ئەمەی (کە باسکرا) ڕێبازی منە کە ڕاستە دە ئێوەش شوێنی بکەون (دەهەم) شوێنی ڕێچکەکانی تر مەکەون چونکە جیاتان دەکاتەوە لە ڕێبازی خوا، ئەوەش پەروەردگارتان فەرمانی پێ کردوون، بۆ ئەوەی خواناس و پارێزکار بن.

(١٥٤) (دوای ئەو ـ ١٠ ـ ئامۆژگاریە، یادتان دەهێنمەوە): پاشان کتێبی تەوراتمان بە موسا بەخشی بۆ ئەوەی نازو نیعمەتی تەواو برژێین بەسەر ئەو کەسەدا کە بەچاکی پیادەی دەکات و جیاکەرەوە و ڕوون کەرەوەی هەموو شتێک بێت و ڕێنموویی و میهرەبانیش بێت، بۆ ئەوەی ئەوانە باوەڕی دامەزراو بهێنن بەگەیشتنەوەیان بە پەروەردگاریان (بۆ لێپرسینەوە و پاداشتی کارو کردەوەیان).

(١٥٥) ئەم قورئانەش کتێبێکی پیرۆزە دامانبەزاند (بۆ سەرجەم خەڵکی، لە هەموو کات و شوێنێکدا) دەئێوەش شوێنی بکەون و خۆتان لە یاخی بوون دوور بگرن، بۆ ئەوەی ڕەحمتان پێبکرێت...

(١٥٦) نەک بڵێن: بەڕاستی کتێبی ئاسمانی هەر بۆ دوو دەستەی (گاورو جوو) پێش ئێمە دابەزێنراوە، لەکاتێکدا بێگومان ئێمە لە خوێندنەوە و لێکۆڵینەوەی کتێبەکانیان بێ ئاگاین و نەخوێندەوارین...

(١٥٧) یان نەک بڵێن: ئەگەر بەڕاستی ئەو کتێبە بۆ ئێمە دابەزێنرایە ئەوە ئێمە لەوان چاکتر پەیڕەویمان دەکرد، جا بێگومان خۆ ئەوەتە ئێوەش بەڵگەی ئاشکراو (قورئانی ڕەوانتان) لەلایەن پەروەردگارتانەوە بۆ هاتووە هاوڕێ لەگەڵ هیدایەت و ڕەحمەت و ڕێنموویدا (کەچی باوەڕی پێ ناهێنن!!)، جا کێ لەوە ستەمکارترە کە بڕوای بەئایەت و فەرمانەکانی خوا نەهێناوە و بەفێڵ و پیلان ڕووی خەڵکیان لێ وەردەگێڕێت، لەئایندەیەکی نزیکدا تۆڵە لەوانە دەسێنین کە ڕووی خۆیان و خەڵکیش وەردەگێڕن لە ئایەتەکانی ئێمە و بەسزای توندو پڕ ئێش و ئازار گرفتاریان دەکەین، بەهۆی ئەوەی ڕووی خۆیان و خەڵکیان وەردەچەرخاند لە ئایینی خوا.

هَلْ يَنظُرُونَ إِلَّآ أَن تَأْتِيَهُمُ ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ أَوْ يَأْتِىَ رَبُّكَ أَوْ يَأْتِىَ بَعْضُ ءَايَٰتِ رَبِّكَ ۗ يَوْمَ يَأْتِى بَعْضُ ءَايَٰتِ رَبِّكَ لَا يَنفَعُ نَفْسًا إِيمَٰنُهَا لَمْ تَكُنْ ءَامَنَتْ مِن قَبْلُ أَوْ كَسَبَتْ فِىٓ إِيمَٰنِهَا خَيْرًا ۗ قُلِ ٱنتَظِرُوٓا۟ إِنَّا مُنتَظِرُونَ ﴿١٥٨﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ فَرَّقُوا۟ دِينَهُمْ وَكَانُوا۟ شِيَعًا لَّسْتَ مِنْهُمْ فِى شَىْءٍ ۚ إِنَّمَآ أَمْرُهُمْ إِلَى ٱللَّهِ ثُمَّ يُنَبِّئُهُم بِمَا كَانُوا۟ يَفْعَلُونَ ﴿١٥٩﴾ مَن جَآءَ بِٱلْحَسَنَةِ فَلَهُۥ عَشْرُ أَمْثَالِهَا ۖ وَمَن جَآءَ بِٱلسَّيِّئَةِ فَلَا يُجْزَىٰٓ إِلَّا مِثْلَهَا وَهُمْ لَا يُظْلَمُونَ ﴿١٦٠﴾ قُلْ إِنَّنِى هَدَىٰنِى رَبِّىٓ إِلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ دِينًا قِيَمًا مِّلَّةَ إِبْرَٰهِيمَ حَنِيفًا ۚ وَمَا كَانَ مِنَ ٱلْمُشْرِكِينَ ﴿١٦١﴾ قُلْ إِنَّ صَلَاتِى وَنُسُكِى وَمَحْيَاىَ وَمَمَاتِى لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿١٦٢﴾ لَا شَرِيكَ لَهُۥ ۖ وَبِذَٰلِكَ أُمِرْتُ وَأَنَا۠ أَوَّلُ ٱلْمُسْلِمِينَ ﴿١٦٣﴾ قُلْ أَغَيْرَ ٱللَّهِ أَبْغِى رَبًّا وَهُوَ رَبُّ كُلِّ شَىْءٍ ۚ وَلَا تَكْسِبُ كُلُّ نَفْسٍ إِلَّا عَلَيْهَا ۚ وَلَا تَزِرُ وَازِرَةٌ وِزْرَ أُخْرَىٰ ۚ ثُمَّ إِلَىٰ رَبِّكُم مَّرْجِعُكُمْ فَيُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمْ فِيهِ تَخْتَلِفُونَ ﴿١٦٤﴾ وَهُوَ ٱلَّذِى جَعَلَكُمْ خَلَٰٓئِفَ ٱلْأَرْضِ وَرَفَعَ بَعْضَكُمْ فَوْقَ بَعْضٍ دَرَجَٰتٍ لِّيَبْلُوَكُمْ فِى مَآ ءَاتَىٰكُمْ ۗ إِنَّ رَبَّكَ سَرِيعُ ٱلْعِقَابِ وَإِنَّهُۥ لَغَفُورٌ رَّحِيمٌۢ ﴿١٦٥﴾

(١٥٨) ئایا ئەوانە چاوەڕێی هیچ شتێك دەكەن جگە لەوەی كە فریشتەی گیان كێشانیان بۆ بێت؟ یان پەروەردگارت خۆی یەكسەر بێت بێ چەند و چوون؟ یان هەندێك لە نیشانەكانی پەروەردگارت دەربكەوێت (كە بەڵگەیە لەسەر بەرپا بوونی قیامەت)؟ لە ڕۆژی هاتنی هەندێك لە نیشانەكانی پەروەردگارت (وەكو هەڵهاتنی ڕۆژ لە خۆرئاوا ...)، ئەو كەسەی ئەو ڕۆژە ئیمان و باوەڕ دەهێنێت، ئەو ئیمان و باوەڕەی سوودی بۆی نابێت ئەگەر پێشتر ئیمانی نەهێنابێت، یان كردەوەی چاكی هاوڕێ لەگەڵ ئیمانەكەیدا ئەنجام نەدابێت، پێیان بڵێ: چاوەڕێ بكەن (بزانین خوا چیتان بەسەر دەهێنێت) ئێمەش چاوەڕوانین.

(١٥٩) بەڕاستی ئەوانەی ئاینەكەیان بەش بەش كردو بوونە دەستە دەستە و پارچە پارچە (بڕوایان بە هەندێكی قورئان هەیە و هەندێكی تری پشت گوێ دەخەن)، ئەوە لە هیچ شتێكدا تۆ لەوان نیت، بەڵكو تۆ لەوان بەریت، بەڕاستی ئەوانە كاروباریان بۆ لای خوایە و تۆڵەی لادانیان لێدەسێنێتەوە، لەوەودوا هەواڵی هەموو ئەو كارو كردەوانەیان پێ دەدات كە ئەنجامی دەدەن.

(١٦٠) ئەوەی بەیەك خێرو چاكەوە هاتبێت ئەوە دە چەندانەی چاكەكە پاداشتی بۆ هەیە، ئەوەش بە گوناهو هەڵەیەكەوە هاتبێت، ئەوە پاداشت نادرێتەوە جگە بەئەندازەی تاوانەكەی نەبێت و ئەوانە ستەمیان لێناكرێت.

(١٦١) (ئەی محمد ﷺ پێیان) بڵێ: بەڕاستی من پەروەردگارم هیدایەت و ڕێنمووی كردووم بۆ ڕێگە و ڕێبازی ڕاست و دروست، ئاینێك كە ڕاگری ژیانی خەڵكە، ئەویش ئاینی ئیبراهیمە كە دوورە لە هەموو لادان و ناڕێكیەكەوە و ئەو هەرگیز لە ریزی موشریك و هاوەڵگەراندا نەبووە.

(١٦٢) (ئەی پێغەمبەرﷺ، ئەی ئیماندار) بڵێ: بەڕاستی نوێژو حەج و دروشمەكانی و(سەرجەم چاكە و بەندایەتیم) هەروەها ژیان و مردنم تایبەتە بۆ خوای پەروەردگاری جیهانیانەوە.

(١٦٣) ئەو زاتە هیچ هاوەڵ و هاوبەش و شەریكێكی نیە و من بەوە فەرمانم پێدراوە و من یەكەم كەسی موسوڵمانانم.

(١٦٤) هەروەها بڵێ: ئایا ڕەوایە من جگە لە خوا بگەڕێم پەروەردگارێكی تر بكەمە پەروەردگاری خۆم لەكاتێكدا كە ئەو زاتە خاوەن و پەروەردگاری هەموو شتێكە؟ هیچ كەسێك هیچ گوناهێك ناكات لەسەر خۆی نەكەوێت، هیچ كەسێك باری گرانی تاوانی كەسی تر هەڵناگرێت، لەوەودوا گەڕانەوەتان هەر بۆ لای پەروەردگارتانە، ئینجا هەواڵی هەموو ئەو شتانەتان پێ دەدات كە جیاوازی و كێشەتان تێدا هەیە.

(١٦٥) خوا هەر ئەو زاتەیە، كە ئێوەی كردووە بەجێنشینی (گەلانی ڕابووردوو) لەم زەویەدا، چەندەها پلەوپایەی هەندێكتانی بەسەر هەندێكی ترتاندا بەرز كردۆتەوە (لە ڕووی زانستی یان سامان یان هێز ... هتد)، بۆ ئەوەی تاقیتان بكاتەوە بەوەی كە پێی بەخشیوون، دڵنیاش بە كە پەروەردگاری تۆ لە تۆڵەسەندنەوەدا خێرایە (لەوانەی كەڵە تاقی كردنەوەكەدا دەرناچن) بێگومان ئەو زاتە لێخۆش بووە و میهرەبانیشە (بۆ سەرفرازان).



سُورَةُ الأَعۡرَافِ

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

الٓمٓصٓ ﴿١﴾ كِتَٰبٌ أُنزِلَ إِلَيۡكَ فَلَا يَكُن فِي صَدۡرِكَ حَرَجٞ مِّنۡهُ لِتُنذِرَ بِهِۦ وَذِكۡرَىٰ لِلۡمُؤۡمِنِينَ ﴿٢﴾ ٱتَّبِعُواْ مَآ أُنزِلَ إِلَيۡكُم مِّن رَّبِّكُمۡ وَلَا تَتَّبِعُواْ مِن دُونِهِۦٓ أَوۡلِيَآءَۗ قَلِيلٗا مَّا تَذَكَّرُونَ ﴿٣﴾ وَكَم مِّن قَرۡيَةٍ أَهۡلَكۡنَٰهَا فَجَآءَهَا بَأۡسُنَا بَيَٰتًا أَوۡ هُمۡ قَآئِلُونَ ﴿٤﴾ فَمَا كَانَ دَعۡوَىٰهُمۡ إِذۡ جَآءَهُم بَأۡسُنَآ إِلَّآ أَن قَالُوٓاْ إِنَّا كُنَّا ظَٰلِمِينَ ﴿٥﴾ فَلَنَسۡـَٔلَنَّ ٱلَّذِينَ أُرۡسِلَ إِلَيۡهِمۡ وَلَنَسۡـَٔلَنَّ ٱلۡمُرۡسَلِينَ ﴿٦﴾ فَلَنَقُصَّنَّ عَلَيۡهِم بِعِلۡمٖۖ وَمَا كُنَّا غَآئِبِينَ ﴿٧﴾ وَٱلۡوَزۡنُ يَوۡمَئِذٍ ٱلۡحَقُّۚ فَمَن ثَقُلَتۡ مَوَٰزِينُهُۥ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡمُفۡلِحُونَ ﴿٨﴾ وَمَنۡ خَفَّتۡ مَوَٰزِينُهُۥ فَأُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ خَسِرُوٓاْ أَنفُسَهُم بِمَا كَانُواْ بِـَٔايَٰتِنَا يَظۡلِمُونَ ﴿٩﴾ وَلَقَدۡ مَكَّنَّٰكُمۡ فِي ٱلۡأَرۡضِ وَجَعَلۡنَا لَكُمۡ فِيهَا مَعَٰيِشَۗ قَلِيلٗا مَّا تَشۡكُرُونَ ﴿١٠﴾ وَلَقَدۡ خَلَقۡنَٰكُمۡ ثُمَّ صَوَّرۡنَٰكُمۡ ثُمَّ قُلۡنَا لِلۡمَلَٰٓئِكَةِ ٱسۡجُدُواْ لِأٓدَمَ فَسَجَدُوٓاْ إِلَّآ إِبۡلِيسَ لَمۡ يَكُن مِّنَ ٱلسَّٰجِدِينَ ﴿١١﴾

سوورەتی (الأعـراف)

بەناوی خوای بەخشندە و میهرەبان

(١) سەرنجی سەرەتای سوورەتی (البقرة) بدە.

(٢) (ئـەم قورئانـە) کتێبێکـە و بـۆت هاتوەتـە خـوارەوە، کـەوابوو بـا سـەغڵەتیی لــە دڵ و دەروونتـدا نـەبێت (لەگـەیاندنیدا) بـۆ ئـەوەی خـەڵکی پــێ بێـدار بکەیتــەوە، هــەروەها یادەوەریشە بۆ ئیمانداران.

(٣) (خەڵکینــە) شـوێنی ئـەو (بەرنامەیــە) بکـەون کـە لەلایــەن پەروەردگارتانــەوە بۆتـان هێنراوەتە خوارەوە، جگە لەو زاتە شـوێنی هیچ پشتیوان و خۆشەویستێکی تر مەکـەون، کـەم یاداوەری و پەند وەردەگرن و بیردەکەنەوە!

(٤) چەندەها شارو دێهاتـمان وێران و کاول کـرد لـەکاتێکدا لـە شـەودا خـەوتبوون، یـان لـەکاتی ئیسراحەتی نیـوەڕۆدا بوون کتوپڕ سزاو تۆڵـەی ئێمە یەخەی پێگرتن.

(٥) ئەو کاتە کە سزای ئێمـە یەخـەی پێگرتـن ئینجا قسەو گوفتار و دۆعا و نزایان هیچ نـەبوو تەنها ئـەوە نـەبێت دەیانوت: بەڕاسـتی ئێمـە ستەمکار بووین، بەڕاستی ئێمە یاخی بوین.

(٦) ئینجا سوێند بێت بە خوا بێگومـان ئێمـە پرسیار دەکەین لەوانـەی کـە پێغەمبـەرانیان بـۆ رەوانـە کـراوە، سـوێند بێـت بـە خــوا لــە پێغەمبــەرانیش دەپرســینەوە (دەربـــارەی هەڵوێستی ئەو خەڵکە بەرامبەریان).

(٧) ئینجا سوێند بێت بە خوا بەڕاستی هەموو بەسەرهاتەکان لەسەر بنچینەی زانیـاری و ئاگـاداری تـەواو دەخەینـە روو و دەیڵێینەوە بۆیان، ئێمە بێ ئاگا نەبووین لە هەڵس و کەوتیان.

(٨) تەرازوو پێوەری راست و دروست لەو رۆژەدایە، ئینجا ئەوەی تای تەرازووی (خـێر و چاکـەکانی) سـەنگین بێـت، ئەوە ئیتر ئەو جۆرە کەسانە سەرکەوتوو سەرفرازن.

(٩) (بەڵام) ئەوەی تای تەرازوی (خێرو چاکەکانی سوک بێت) ئەو جۆرە کەسانە ئەوانەن کە خۆیـان دۆڕان و خۆیـان لەدەستدا بەهۆی ئەوەی کە بڕوایان بەبەڵگە و ئایەتەکانی ئێمە نیە و ستەم دەکەن.

(١٠) سوێند بەخوا بەڕاستی ئێمە ئێوەمان نیشتەجێ کرد لەم زەویەدا و دەسەڵاتـمان پێبەخشین و جۆرەهـا هۆکـاری ژیانمان تیایدا بۆ سازاندوون (لە خواردن و خواردنەوەو هۆکانی گواستنەوەو پۆشاک و ناومال و ئاوو هـەواو... هتـد، کـەچی لەبەرامبـەر ئـەو هـەموو نـاز و نیعمەتـە بێشـوماره) سوپاسـی کـەمی نیعمەتــەکان دەکـەن یـان کـەمتان سوپاسگوزارن.

(١١) سوێند بەخوا بەڕاستی ئێمە (باوە گـەورەی) ئێوەمـان دروسـت کـردو نـەخش و نیگـاری رواڵـەت و روخسـاری ئێوەمـان کێشا، پاشان وتـمان بە فریشتەکان: ئادەی سوژدە بەرن بۆ ئادەم (سوژدەی رێزو بەفەرمانی خوا) جـا هـەموو فریشتەکان سوژدەیان برد جگە لە ئیبلیس (کە فەرمانی خوای شکاندو) لە سوژدەبەران نەبوو.

قَالَ مَا مَنَعَكَ أَلَّا تَسْجُدَ إِذْ أَمَرْتُكَ قَالَ أَنَا۠ خَيْرٌ مِّنْهُ خَلَقْتَنِي مِن نَّارٍ وَخَلَقْتَهُۥ مِن طِينٍ ﴿١٢﴾ قَالَ فَٱهْبِطْ مِنْهَا فَمَا يَكُونُ لَكَ أَن تَتَكَبَّرَ فِيهَا فَٱخْرُجْ إِنَّكَ مِنَ ٱلصَّٰغِرِينَ ﴿١٣﴾ قَالَ أَنظِرْنِيٓ إِلَىٰ يَوْمِ يُبْعَثُونَ ﴿١٤﴾ قَالَ إِنَّكَ مِنَ ٱلْمُنظَرِينَ ﴿١٥﴾ قَالَ فَبِمَآ أَغْوَيْتَنِي لَأَقْعُدَنَّ لَهُمْ صِرَٰطَكَ ٱلْمُسْتَقِيمَ ﴿١٦﴾ ثُمَّ لَءَاتِيَنَّهُم مِّنۢ بَيْنِ أَيْدِيهِمْ وَمِنْ خَلْفِهِمْ وَعَنْ أَيْمَٰنِهِمْ وَعَن شَمَآئِلِهِمْ وَلَا تَجِدُ أَكْثَرَهُمْ شَٰكِرِينَ ﴿١٧﴾ قَالَ ٱخْرُجْ مِنْهَا مَذْءُومًا مَّدْحُورًا لَّمَن تَبِعَكَ مِنْهُمْ لَأَمْلَأَنَّ جَهَنَّمَ مِنكُمْ أَجْمَعِينَ ﴿١٨﴾ وَيَٰٓـَٔادَمُ ٱسْكُنْ أَنتَ وَزَوْجُكَ ٱلْجَنَّةَ فَكُلَا مِنْ حَيْثُ شِئْتُمَا وَلَا تَقْرَبَا هَٰذِهِ ٱلشَّجَرَةَ فَتَكُونَا مِنَ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿١٩﴾ فَوَسْوَسَ لَهُمَا ٱلشَّيْطَٰنُ لِيُبْدِيَ لَهُمَا مَا وُۥرِيَ عَنْهُمَا مِن سَوْءَٰتِهِمَا وَقَالَ مَا نَهَىٰكُمَا رَبُّكُمَا عَنْ هَٰذِهِ ٱلشَّجَرَةِ إِلَّآ أَن تَكُونَا مَلَكَيْنِ أَوْ تَكُونَا مِنَ ٱلْخَٰلِدِينَ ﴿٢٠﴾ وَقَاسَمَهُمَآ إِنِّي لَكُمَا لَمِنَ ٱلنَّٰصِحِينَ ﴿٢١﴾ فَدَلَّىٰهُمَا بِغُرُورٍ فَلَمَّا ذَاقَا ٱلشَّجَرَةَ بَدَتْ لَهُمَا سَوْءَٰتُهُمَا وَطَفِقَا يَخْصِفَانِ عَلَيْهِمَا مِن وَرَقِ ٱلْجَنَّةِ وَنَادَىٰهُمَا رَبُّهُمَآ أَلَمْ أَنْهَكُمَا عَن تِلْكُمَا ٱلشَّجَرَةِ وَأَقُل لَّكُمَآ إِنَّ ٱلشَّيْطَٰنَ لَكُمَا عَدُوٌّ مُّبِينٌ ﴿٢٢﴾

(١٢) خوا فەرمووی: باشە، چی بەرگری کردیت ئەی ئیبلیس کە سوژدە نەبەیت کاتێک فەرمانم پێدایت؟ شەیتان وتی: من لەو چاکترم، (چونکە) تۆ منت لە ئاگر دروست کردوە و ئەوت لە قوڕ دروستکردووە.

(١٣) خوا فەرمووی: دەی کەواتە دابەزە و لە بەهەشت یان لە ئاسماندا یان لە پلەو پایەی بەندایەتی، چونکە تۆ بۆت نیە لەوێدا فیز بکەیت و خۆت بەگەورە دابنێیت، جا تا زووە دەرچۆ، چونکە بەڕاستی تۆ لە ڕیسواو بچوک و بێ نرخەکانیت.

(١٤) شەیتان وتی: داواکارم کە مۆڵەتم بدەیت تا ئەو ڕۆژەی کە هەموو نەوەی ئادەم زیندوو دەکرێنەوە.

(١٥) خوا فەرمووی: بەڕاستی تۆ لە مۆڵەت دراوانیت.

(١٦) شەیتان وتی: بەهۆی ئەوەی کە تۆ منت گومڕاو سەرگەردان کرد، ئەوە سوێند بێت منیش لە ڕێگە ڕاستەکەتدا بۆیان دادەنیشم (لایان بدەم)..

(١٧) پاشان سوێند بەخوا لە بەردەمیانەوە، لە پشتیانەوە، لە لای ڕاستیانەوە، لە لای چەپیانەوە، بۆیان دێم و (دنیایان لاخۆشەویست دەکەم و گومانیان دەربارەی قیامەت لادروست دەکەم) و دەستت ناکەوێت زۆربەیان سوپاسگوزار بن.

(١٨) خوا فەرمووی: لە بەهەشت دەرچۆرە دەرەوە بەسەرشۆڕی و ڕیسوایی و دەرکراوی، سوێند بە خوا ئەو کەسەی شوێنت کەوت لەوان، ئەوە بێگومان دۆزەخ پڕ دەکەم لە ئێوە هەموو.

(١٩) (تۆش) ئەی ئادەم، خۆت و هاوسەرەکەت لەبەهەشتدا نیشتەجێ بن، جا لە هەر کوێ ئارەزووتان لێ بوو (خواردەمەنی و میوەیە) بخۆن، (بەڵام) نزیکی ئەم درەختە مەکەون (درەختێکی تایبەتی بەرداربوو، بۆ تاقی کردنەوەیان خوای گەورە بڕیاریدا کە هەر نزیکی نەکەون، چ جای لە بەرو بوومی بخۆن) ئەو کاتە دەچنە ڕیزی ستەمکارانەوە.

(٢٠) شەیتان (ئەو سنوورەی بۆ ئادەم و حەوا بەفرسەت زانی) و ئینجا کەوتە فرێدانی وەسوەسەو خەتەرە و خەیاڵ بۆ ناو دڵ و دەروونیان تا ئەو عەیب و عارەیان دەربخات کە شاراوەبوو لێیان (دوایی خۆی ئاشکراکرد)و پێی وتن: پەروەردگارتان ئەم درەختەی لێ قەدەغە نەکردوون تەنها لەبەر ئەوەیە نەوەکو ببنە فریشتە، یاخود بۆ ئەوەیە نەوەکو لە نەمران بن!!

(٢١) (ئەوسا شەیتان زانی دەترسن و دوودڵن) سوێندی بۆ خواردن کە من بەڕاستی لە ئامۆژگارانم بۆ ئێوەو دڵسۆزتانم!!

(٢٢) ئیتر شەیتان بەفێڵ و پیلان فریوی دان (بەرەولای درەختەکەی بردن) جاکاتێک تامی بەرو بوومی درەختەکەیان چەشت، هەرچی عەیب و عاریان هەیە کەوتە دەرەوە، (ناچار بەپەلە) دەستیاندایە گەڵای درەختەکانی بەهەشت عەیب و عاری خۆیان پێ دادەپۆشی و پەروەردگاریان بانگی کردن و فەرمووی: ئایا من قەدەغەی ئەو درەختەم لێنەکردن و پێم نەوتن، کە بەڕاستی شەیتان بۆ ئێوە دوژمنێکی ئاشکرایە؟!

قَالَا رَبَّنَا ظَلَمْنَآ أَنفُسَنَا وَإِن لَّمْ تَغْفِرْ لَنَا وَتَرْحَمْنَا لَنَكُونَنَّ مِنَ ٱلْخَٰسِرِينَ ﴿٢٣﴾ قَالَ ٱهْبِطُوا۟ بَعْضُكُمْ لِبَعْضٍ عَدُوٌّ ۖ وَلَكُمْ فِى ٱلْأَرْضِ مُسْتَقَرٌّ وَمَتَٰعٌ إِلَىٰ حِينٍ ﴿٢٤﴾ قَالَ فِيهَا تَحْيَوْنَ وَفِيهَا تَمُوتُونَ وَمِنْهَا تُخْرَجُونَ ﴿٢٥﴾ يَٰبَنِىٓ ءَادَمَ قَدْ أَنزَلْنَا عَلَيْكُمْ لِبَاسًا يُوَٰرِى سَوْءَٰتِكُمْ وَرِيشًا ۖ وَلِبَاسُ ٱلتَّقْوَىٰ ذَٰلِكَ خَيْرٌ ۚ ذَٰلِكَ مِنْ ءَايَٰتِ ٱللَّهِ لَعَلَّهُمْ يَذَّكَّرُونَ ﴿٢٦﴾ يَٰبَنِىٓ ءَادَمَ لَا يَفْتِنَنَّكُمُ ٱلشَّيْطَٰنُ كَمَآ أَخْرَجَ أَبَوَيْكُم مِّنَ ٱلْجَنَّةِ يَنزِعُ عَنْهُمَا لِبَاسَهُمَا لِيُرِيَهُمَا سَوْءَٰتِهِمَآ ۗ إِنَّهُۥ يَرَىٰكُمْ هُوَ وَقَبِيلُهُۥ مِنْ حَيْثُ لَا تَرَوْنَهُمْ ۗ إِنَّا جَعَلْنَا ٱلشَّيَٰطِينَ أَوْلِيَآءَ لِلَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ ﴿٢٧﴾ وَإِذَا فَعَلُوا۟ فَٰحِشَةً قَالُوا۟ وَجَدْنَا عَلَيْهَآ ءَابَآءَنَا وَٱللَّهُ أَمَرَنَا بِهَا ۗ قُلْ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَأْمُرُ بِٱلْفَحْشَآءِ ۖ أَتَقُولُونَ عَلَى ٱللَّهِ مَا لَا تَعْلَمُونَ ﴿٢٨﴾ قُلْ أَمَرَ رَبِّى بِٱلْقِسْطِ ۖ وَأَقِيمُوا۟ وُجُوهَكُمْ عِندَ كُلِّ مَسْجِدٍ وَٱدْعُوهُ مُخْلِصِينَ لَهُ ٱلدِّينَ ۚ كَمَا بَدَأَكُمْ تَعُودُونَ ﴿٢٩﴾ فَرِيقًا هَدَىٰ وَفَرِيقًا حَقَّ عَلَيْهِمُ ٱلضَّلَٰلَةُ ۗ إِنَّهُمُ ٱتَّخَذُوا۟ ٱلشَّيَٰطِينَ أَوْلِيَآءَ مِن دُونِ ٱللَّهِ وَيَحْسَبُونَ أَنَّهُم مُّهْتَدُونَ ﴿٣٠﴾

(٢٣) (ئەوسا ئیتر هەردووکیان هەستیان بەهەڵەی خۆیان کردو) وتیان: پەروەردگارا ئێمە ستەممان لە خۆمان کرد، خۆ ئەگەر لێمان خۆش نەبیت و بەزەییت پێماندا نەیەتەوە، ئەوە بەڕاستی ئێمە سوێند بە خوا لە خەسارەتمەند و زەرەرمەندانین.

(٢٤) خوای گەورە فەرمووی: ئیتر دابەزن هەندێکتان دوژمنی هەندێکتانن (شەیتان و دارو دەستەی دوژمنی ئێوەن و ئەوەی ئادەمیش بەهۆی پیلانی شەیتانەوە دوژمنایەتی یەکتر دەکەن)، بۆتان هەیە لە زەویدا نیشتەجێ بوون و هۆی رابواردن و ژیان تا ماوەیەک .

(٢٥) خوا فەرمووی (پێیان): هەر لە زەویدا دەژین و لەوێش دەمرن و (تێکەڵ بەخاکی دەبن، لەکاتی دیاری کراویشدا) هەر لە ناخیەوە دەهێنرێنە دەرەوە (بۆ لێپرسینەوە).

(٢٦) ئەی نەوەی ئادەم، ئێمە بەڕاستی پۆشاکی لەبارمان بۆ فەراهەم هێناون، عەورەت و ئەوەی پێتان ناخۆشە دەربکەوێت دای ئەپۆشێت، هەروەها جل و بەرگی جوانیش کە خۆتانی پێ برازێننەوە (بەڵام بیرتان نەچێت) کە پۆشاکی تەقواو خواناسی چاکتر و خێردارتر و بەفەڕترە، ئەو پۆشاکە (ماددی و مەعنەویانە) لە نیشانە و بەڵگەکانی خوای گەورەن بۆ ئەوەی یاداوەری وەربگرن و (یادی بەهەشت بکەن).

(٢٧) ئەی نەوەی ئادەم: شەیتان، ئێوەش لە خشتە نەبات، هەروەک باوک و دایکتانی لە خشتە بردو لە بەهەشتدا بە دەرکردنی دان، لەکاتێکدا دەستی کرد بەداماڵینی پۆشاکەکانیان تا عەورەتیان پیشانی یەکتربدات، بێگومان شەیتان و دارو دەستەی ئێوە دەیبینن، لە شوێنێکدا کە(دنیایە) ئێوە ئەوان نابینن، جا دڵنیابن کە ئێمە شەیتانەکانمان کردووە بە یارو یاوەری ئەوانەی باوەڕ ناهێنن.

(٢٨) کاتێکیش (بێ باوەڕان) تاوان و گوناهێک ئەنجام بدەن دەڵێن: باوو باپیرانیشمان دیوە ئەم کارەیان کردوەو خوای گەورە خۆی فەرمانی پێداوین بیکەین!! پێیان بڵێ: (نەخێر وانییە) چونکە بەڕاستی خوا فەرمان بەگوناهو تاوان و کاری نابەجێ نادات، چۆن (جەسارەت دەکەن) و شتێک هەڵدەبەستن بۆ خوا کە نازانن وتویەتی یان نا.

(٢٩) (ئەی محمد ﷺ) بڵێ: پەروەردگارم فەرمانی بە دادپەروەری داوە، لەکاتی هەرپەرستن و نوێژێکدا، لە هەموو مزگەوتێکدا، رووی دڵ و روخسارتان بەڕاستی لە پەروەردگارتان بکەن و بیپەرستن و لێی بپاڕێنەوە، لەکاتێکدا دینداری بێگەردو دڵسۆزانە هەر بۆ ئەو زاتەیە، چونکە هەر چۆن دروستی کردوون لە سەرەتاوە، لە ئایندەشدا هەر بۆ لای ئەو دەگەڕێنەوە...

(٣٠) (جا ئەو کاتە دەبنە دوو دەستە) دەستەیەک هیدایەت و رێنموویی وەرگرتووە، دەستەیەکیش بڕیاری گومڕای و سەر لێشێواوی بەسەردا چەسپاوە، چونکە بەڕاستی ئەوانە بێجگە لە خوا شەیتانەکانیشیان کردە پشتیوان و خۆشەویستی خۆیان، واش دەزانن کە رێگەی راست و دروستیان گرتۆتەبەر.



﴿ يَٰبَنِيٓ ءَادَمَ خُذُواْ زِينَتَكُمۡ عِندَ كُلِّ مَسۡجِدٖ وَكُلُواْ وَٱشۡرَبُواْ وَلَا تُسۡرِفُوٓاْۚ إِنَّهُۥ لَا يُحِبُّ ٱلۡمُسۡرِفِينَ ﴿٣١﴾ قُلۡ مَنۡ حَرَّمَ زِينَةَ ٱللَّهِ ٱلَّتِيٓ أَخۡرَجَ لِعِبَادِهِۦ وَٱلطَّيِّبَٰتِ مِنَ ٱلرِّزۡقِۚ قُلۡ هِيَ لِلَّذِينَ ءَامَنُواْ فِي ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا خَالِصَةٗ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِۗ كَذَٰلِكَ نُفَصِّلُ ٱلۡأٓيَٰتِ لِقَوۡمٖ يَعۡلَمُونَ ﴿٣٢﴾ قُلۡ إِنَّمَا حَرَّمَ رَبِّيَ ٱلۡفَوَٰحِشَ مَا ظَهَرَ مِنۡهَا وَمَا بَطَنَ وَٱلۡإِثۡمَ وَٱلۡبَغۡيَ بِغَيۡرِ ٱلۡحَقِّ وَأَن تُشۡرِكُواْ بِٱللَّهِ مَا لَمۡ يُنَزِّلۡ بِهِۦ سُلۡطَٰنٗا وَأَن تَقُولُواْ عَلَى ٱللَّهِ مَا لَا تَعۡلَمُونَ ﴿٣٣﴾ وَلِكُلِّ أُمَّةٍ أَجَلٞۖ فَإِذَا جَآءَ أَجَلُهُمۡ لَا يَسۡتَأۡخِرُونَ سَاعَةٗ وَلَا يَسۡتَقۡدِمُونَ ﴿٣٤﴾ يَٰبَنِيٓ ءَادَمَ إِمَّا يَأۡتِيَنَّكُمۡ رُسُلٞ مِّنكُمۡ يَقُصُّونَ عَلَيۡكُمۡ ءَايَٰتِي فَمَنِ ٱتَّقَىٰ وَأَصۡلَحَ فَلَا خَوۡفٌ عَلَيۡهِمۡ وَلَا هُمۡ يَحۡزَنُونَ ﴿٣٥﴾ وَٱلَّذِينَ كَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِنَا وَٱسۡتَكۡبَرُواْ عَنۡهَآ أُوْلَٰٓئِكَ أَصۡحَٰبُ ٱلنَّارِۖ هُمۡ فِيهَا خَٰلِدُونَ ﴿٣٦﴾ فَمَنۡ أَظۡلَمُ مِمَّنِ ٱفۡتَرَىٰ عَلَى ٱللَّهِ كَذِبًا أَوۡ كَذَّبَ بِـَٔايَٰتِهِۦٓۚ أُوْلَٰٓئِكَ يَنَالُهُمۡ نَصِيبُهُم مِّنَ ٱلۡكِتَٰبِۖ حَتَّىٰٓ إِذَا جَآءَتۡهُمۡ رُسُلُنَا يَتَوَفَّوۡنَهُمۡ قَالُوٓاْ أَيۡنَ مَا كُنتُمۡ تَدۡعُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِۖ قَالُواْ ضَلُّواْ عَنَّا وَشَهِدُواْ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمۡ أَنَّهُمۡ كَانُواْ كَٰفِرِينَ ﴿٣٧﴾

(٣١) ئەی نەوەی ئادەم، خۆتان برازێننەوە بە پۆشاکی لەبەر کردن، لەکاتی هەموو نوێژو چوونە ناو مزگەوتێکدا، بخۆن و بخۆنەوە (لە نازو نیعمەتەکان) بەڵام زیادەڕەوی مەکەن، چونکە بەڕاستی خوا لە سنوور دەرچووان و زیادەڕەوانی خۆش ناوێت.

(٣٢) (ئەی پێغەمبەر ﷺ پێیان) بڵێ: ئەوە کێیە پۆشاک و زینەت و جوانییە خواییەکانی لە بەندەکانی حەرام کردوە کە لە بنەڕەتدا خۆی بۆی بەدیهێناون؟ هەروەها ئەوە کێیە ڕزق و ڕۆزیە چاک و پاکەکانی حەرام کردوە؟! بەو خەڵکە بڵێ: هەموو ئەو شتانە بۆ ئیمانداران‌ە لە ژیانی دنیاداو لە کاتێکدا پاڵفتەن لە ڕۆژی قیامەتدا، تا بەو شێوەیە ئایەت و فەرمانەکان ڕوون دەکەینەوە بۆ کەسانێک کە بزانن و هوشیار بن.

(٣٣) پێیان بڵێ: بەڕاستی پەروەردگارم هەرچی گوناهو خراپەیە حەرامی کردووە چ ئەوانەی ئاشکران، چ ئەوانەی پەنهانن، هەروەها هەموو گوناهو داخوازی و دەستدرێژیەکی بەناحەقی حەرام کردووە، شتێک بکەن بەشەریک و هاوەڵ بۆ خوا کە هیچ دەسەڵاتی پێنەداوە، هەروەها حەرامی کردووە لە خۆتانەوە بەناوی خواوە، دوور لە هەموو زانیاری و زانستێک شت بڵێن.

(٣٤) بۆ هەموو نەتەوەیەک تەمەنێکی سنووردار هەیە، (لەکاتی دیاریکراودا کۆتایی بەدەوری دەهێنرێت)، جا کاتێک کۆتایی تەمەنیان هات، ئەوە نە تاوێک دوا دەکەون نە تاوێکیش پێش دەکەون.

(٣٥) ئەی نەوەی ئادەم، ئەگەر پێغەمبەرانتان لە خۆتان بۆ هات کە ئایەت و فەرمانەکانی منیان بەسەردا دەخوێننەوە، جا ئەو کەسەی بە تەقواو لە خوا ترس بێت ئەوە ترسیان لەسەر نیە و دڵگران و غەمبار نابن.

(٣٦) (بەڵام) ئەوانەش بڕوایان بەئایەت و فەرمانەکانی ئێمە نەبووە، لووت بەرز بوون بەرامبەریان ئا ئەوانە نیشتەجێی ناو ئاگری دۆزەخن و بەهەمیشەیی تیایدان.

(٣٧) جا کێ لەوە ستەمکارترە کە بەدەم خواوە درۆ هەڵدەبەستێت، یان بڕوای بەئایەتەکانی نەهێناوە، ئا ئەوانە ئەوەی کە بۆیان بڕیار دراوە لە دنیادا دەستیان دەکەوێت، هەتا ئەو کاتەی فریشتە نێردراوەکانمان بۆیان دێن گیانیان دەکێشن، ئەوسا پێیان دەڵێن: کوان ئەوانەی جگەلە خوا هانا و هاوارتان بۆ دەبردن و دەتانپەرستن؟! (بەسەرسامیەوە) دەڵێن: (نازانین) لێمان ون بوون، (ئەوسا بەناچاریی) شایەتی لە خۆیان دەدەن کە بەڕاستی ئەوان هەر بێ باوەڕ بوون.

قَالَ ادْخُلُوا فِي أُمَمٍ قَدْ خَلَتْ مِن قَبْلِكُم مِّنَ الْجِنِّ وَالْإِنسِ
فِي النَّارِ كُلَّمَا دَخَلَتْ أُمَّةٌ لَّعَنَتْ أُخْتَهَا حَتَّىٰ إِذَا ادَّارَكُوا فِيهَا
جَمِيعًا قَالَتْ أُخْرَاهُمْ لِأُولَاهُمْ رَبَّنَا هَٰؤُلَاءِ أَضَلُّونَا فَآتِهِمْ
عَذَابًا ضِعْفًا مِّنَ النَّارِ قَالَ لِكُلٍّ ضِعْفٌ وَلَٰكِن لَّا تَعْلَمُونَ ﴿٣٨﴾
وَقَالَتْ أُولَاهُمْ لِأُخْرَاهُمْ فَمَا كَانَ لَكُمْ عَلَيْنَا مِن فَضْلٍ
فَذُوقُوا الْعَذَابَ بِمَا كُنتُمْ تَكْسِبُونَ ﴿٣٩﴾ إِنَّ الَّذِينَ كَذَّبُوا
بِآيَاتِنَا وَاسْتَكْبَرُوا عَنْهَا لَا تُفَتَّحُ لَهُمْ أَبْوَابُ السَّمَاءِ وَلَا يَدْخُلُونَ
الْجَنَّةَ حَتَّىٰ يَلِجَ الْجَمَلُ فِي سَمِّ الْخِيَاطِ وَكَذَٰلِكَ نَجْزِي
الْمُجْرِمِينَ ﴿٤٠﴾ لَهُم مِّن جَهَنَّمَ مِهَادٌ وَمِن فَوْقِهِمْ غَوَاشٍ
وَكَذَٰلِكَ نَجْزِي الظَّالِمِينَ ﴿٤١﴾ وَالَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا
الصَّالِحَاتِ لَا نُكَلِّفُ نَفْسًا إِلَّا وُسْعَهَا أُولَٰئِكَ أَصْحَابُ
الْجَنَّةِ هُمْ فِيهَا خَالِدُونَ ﴿٤٢﴾ وَنَزَعْنَا مَا فِي صُدُورِهِم مِّنْ غِلٍّ
تَجْرِي مِن تَحْتِهِمُ الْأَنْهَارُ وَقَالُوا الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِي هَدَانَا لِهَٰذَا
وَمَا كُنَّا لِنَهْتَدِيَ لَوْلَا أَنْ هَدَانَا اللَّهُ لَقَدْ جَاءَتْ رُسُلُ رَبِّنَا بِالْحَقِّ
وَنُودُوا أَن تِلْكُمُ الْجَنَّةُ أُورِثْتُمُوهَا بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴿٤٣﴾

(٣٨) (ئەوسا خوا فەرمانیدا) و فەرمووی: دە بچنە ریزی ئەو کۆمەڵانەوە کە پێش ئێوە هەبوون (لەگومڕاکان) لەدەستەی پەری و نادەمیزادەکان لەناو دۆزەخدا، هەر کاتێک هەر کۆمەڵ و دەستەیەک دەچنە ناوی نەفرین دەکەن لە هاوتاین و هاو بیرانیان، هەتا ئەو کاتەی هەموویان کۆ دەکرێنەوە و بەسەریەکدا دەدرێن لە ناویدا، شوێنکەوتەکان روو بەگەورەکانیان دەڵێن: پەروەردگارا تا ئەوانە ئێمەیان گومڕاکرد، دە تۆش لەناو دۆزەخدا سزای دوو بەرامبەریان بدە!!(خوای گەورەش فەرمووی): بۆ هەموو لایەک (سزاو تۆڵە) دوو بەرامبەرە بەڵام ئێوە پێی نازانن.

(٣٩) (پاشان) دەستە پێشوەکان بە دواییەکان دەڵێن: وەنەبێت ئێوە هیچ رێزو فەزڵێکتان هەبێت بەسەر ئێمەدا، دە ئێوەش بچێژن سزاو ئازار بەهۆی ئەو کارو کردەوە نالەبارانەوە کە ئەنجامتان دەدا.

(٤٠) بێگومان ئەوانەی بڕوایان بە ئایەت و فەرمانەکانی ئێمە نەهێناوە و خۆیان لە ئاستیدا بەگەورە داناوە، ئەوانە دەروازەکانی ئاسمانیان بۆ ناکرێتەوە و ناچنە بەهەشتەوە هەتا وشتر ئەچێت بەناو کونی دەرزیدا، ئا بەو شێوەیە ئێمە پاداشتی تاوانباران دەدەینەوە و تۆڵەیان لێدەسێنین.

(٤١) ئەوانە (لەناو دۆزەخدا) رایەخی ئاگرینیان هەیە، لە سەروشیانەوە (سەقف و بەتانی و لێفەی) ئاگرین داپۆشەریانە، (سەرو خواریان ئاگرە) بێگومان هەر بەو شێوەیە پاداشتی ستەمکاران دەدەینەوە و تۆڵەیان لێ دەسێنین.

(٤٢) (لەلایەکی ترەوە) ئەوانەی کە باوەڕیان هێناوەو کاروکردەوە چاکەکانیان ئەنجامداوە (بەمەرجێک) ئێمە لە توانای هەرکەس زیاتر داخوازی ناکەین، ئەوانە خاوەن و نیشتەجێی بەهەشتن و ژیانیان بەردەوام و هەمیشەییە تیایدا.

(٤٣) (هەر لە دەروازەی بەهەشتدا) هەرچی بوغزو کینەیەک لە دڵ و دەروون و سینەیاندا بوو ئێمە دامان ڕنی (تا بە سینەیەکی ساف و دڵ و دەروونێکی بێگەردەوە بچنە ناو بەهەشتەوە) کەچەندەها رووبار بەژێر درەختەکانیداو بە بەردەم کۆشکەکانیدا رەوان و جاری دەبێت، (ئەوسا ئیتر هەمووان بەیەک دەنگ و یەک ئاواز) دەڵێن: سوپاس و ستایش بۆ ئەو خوایەی کە هیدایەت و رێنموویی کردین بۆ ئەم جێگەو رێگە خۆشە، ئەگەر ئەو خوایە هیدایەت و رێنموویی نەکردینایە هەرگیز رێگای هیدایەتمان نەدەزانی و ئەم پاداشتەمان وەرنەدەگرت، سوێند بەخوا بەڕاستی پێغەمبەرانی پەروەردگارمان بە حەق و راستیەوە هاتن، ئەوسا بانگیان لێکرا: ئەوە ئەو بەهەشتەیە کە پێتان دراوە بەهۆی ئەو کارو کردەوانە کە ئەنجامتان دەدا.

وَنَادَىٰٓ أَصۡحَٰبُ ٱلۡجَنَّةِ أَصۡحَٰبَ ٱلنَّارِ أَن قَدۡ وَجَدۡنَا مَا وَعَدَنَا رَبُّنَا حَقّٗا فَهَلۡ وَجَدتُّم مَّا وَعَدَ رَبُّكُمۡ حَقّٗاۖ قَالُواْ نَعَمۡۚ فَأَذَّنَ مُؤَذِّنُۢ بَيۡنَهُمۡ أَن لَّعۡنَةُ ٱللَّهِ عَلَى ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٤٤﴾ ٱلَّذِينَ يَصُدُّونَ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ وَيَبۡغُونَهَا عِوَجٗا وَهُم بِٱلۡأٓخِرَةِ كَٰفِرُونَ ﴿٤٥﴾ وَبَيۡنَهُمَا حِجَابٞۚ وَعَلَى ٱلۡأَعۡرَافِ رِجَالٞ يَعۡرِفُونَ كُلَّۢا بِسِيمَىٰهُمۡۚ وَنَادَوۡاْ أَصۡحَٰبَ ٱلۡجَنَّةِ أَن سَلَٰمٌ عَلَيۡكُمۡۚ لَمۡ يَدۡخُلُوهَا وَهُمۡ يَطۡمَعُونَ ﴿٤٦﴾ ۞ وَإِذَا صُرِفَتۡ أَبۡصَٰرُهُمۡ تِلۡقَآءَ أَصۡحَٰبِ ٱلنَّارِ قَالُواْ رَبَّنَا لَا تَجۡعَلۡنَا مَعَ ٱلۡقَوۡمِ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٤٧﴾ وَنَادَىٰٓ أَصۡحَٰبُ ٱلۡأَعۡرَافِ رِجَالٗا يَعۡرِفُونَهُم بِسِيمَىٰهُمۡ قَالُواْ مَآ أَغۡنَىٰ عَنكُمۡ جَمۡعُكُمۡ وَمَا كُنتُمۡ تَسۡتَكۡبِرُونَ ﴿٤٨﴾ أَهَٰٓؤُلَآءِ ٱلَّذِينَ أَقۡسَمۡتُمۡ لَا يَنَالُهُمُ ٱللَّهُ بِرَحۡمَةٍۚ ٱدۡخُلُواْ ٱلۡجَنَّةَ لَا خَوۡفٌ عَلَيۡكُمۡ وَلَآ أَنتُمۡ تَحۡزَنُونَ ﴿٤٩﴾ وَنَادَىٰٓ أَصۡحَٰبُ ٱلنَّارِ أَصۡحَٰبَ ٱلۡجَنَّةِ أَنۡ أَفِيضُواْ عَلَيۡنَا مِنَ ٱلۡمَآءِ أَوۡ مِمَّا رَزَقَكُمُ ٱللَّهُۚ قَالُوٓاْ إِنَّ ٱللَّهَ حَرَّمَهُمَا عَلَى ٱلۡكَٰفِرِينَ ﴿٥٠﴾ ٱلَّذِينَ ٱتَّخَذُواْ دِينَهُمۡ لَهۡوٗا وَلَعِبٗا وَغَرَّتۡهُمُ ٱلۡحَيَوٰةُ ٱلدُّنۡيَاۚ فَٱلۡيَوۡمَ نَنسَىٰهُمۡ كَمَا نَسُواْ لِقَآءَ يَوۡمِهِمۡ هَٰذَا وَمَا كَانُواْ بِـَٔايَٰتِنَا يَجۡحَدُونَ ﴿٥١﴾

(٤٤) ((پاشان) نیشتەجێیانی بەهەشت بانگی نیشتەجێکانی دۆزەخیان کرد: بەڕاستی ئەو بەڵێنەی کە پەروەردگارمان پێی دابووین دەستمانکەوت و پێی بەخشین، ئایا ئێوەش ئەو بەڵێنەی کە پەروەردگارتان دابووی بەڕاستی دەستانکەوت؟! (لە وەڵامدا بەدڵ شکاوی و غەم و پەژارەیەکی زۆرەوە) وتیان: بەڵێ.. ئەوسا جارچییەک جاڕیدا لە نێوانیاندا و هاواری کرد: نەفرەتی خوا لە ستەمکاران بێت...

(٤٥) ئەوانەی کە بە ئەرمە بڕی بەرهەڵستی ڕێبازی خوا دەکەن و کۆسپ و تەگەرە دەخەنە ڕێگەی و ڕێبازی خوایان بە خوار و خێچیی دەوێت، لەکاتێکدا هەمیشە ئەوان بێ بڕوان بە زیندوو بوونەوە و لێپرسینەوە.

(٤٦) لەنێوان بەهەشتی و دۆزەخیەکاندا دیوارو پەردەیەک هەیە، بەسەر شوێنە بەرزەکانیشەوە کەسانێکی مەرد هەن هەردوولا بەچاکی دەناسن بەهۆی ناونیشانەکانیانەوە (کاتێک ڕوو دەکەنە بەهەشت) بانگ دەکەن لە نیشتەجێکانی و دەڵێن: سڵاوتان لێ بێت (خۆشی لە خۆتان)، ئەوانە هێشتا نەچوونەتە ناوی بەڵام بەهیوان و ئومێدیان هەیە.

(٤٧) کاتێکیش ڕوویان بەرەو ڕووی دۆزەخیان وەردەچەرخێنرێت دەڵێن: پەروەردگارا مەمانگێرە لەگەڵ دەستەی ستەمکاراندا.

(٤٨) ئەوانەی کە لەسەر شوێنە بەرزەکانن بانگی کەسانێک دەکەن (لە دۆزەخیان) کە بەڕواڵەت و سیمایاندا دەیانناسن و پێیان دەڵێن: (خۆ ئێستا لاتان ڕوونە) کە دارو دەستەو هێزو توانا و ماڵ و سامانتان فریاتان نەکەوت؟! هەروەها فیز و لووت بەرزی و خۆ فش کردنەوەتان بەهاناتانەوە نەهات!!

(٤٩) ئایا ئەوانە ئەو کەسانەن کەکاتی خۆی سوێندتان دەخوارد ڕەحمەتی خوا نایانگرێتەوە! (ئەوەتە خوا پێیان دەفەرموێت): دە بچنە بەهەشتەوە، نە ترس و بیمتان لەسەرە نەغەم و پەژارەش دەخۆن.

(٥٠) (دۆزەخیان بەدەم ئاهو ناڵەو غەم و پەژارەوە) هاواریان لە بەهەشتیان کردو لێیان پاڕانەوەو وتیان: نەختێک ئاومان بەسەردا بڕێژن، یان بەشمان بدەن لەو ڕزق و ڕۆزیانەی کە خوا پێی بەخشیوون (بەهەشتیەکان لە وەڵامیاندا) وتیان: بەڕاستی خوا خواردن و خواردنەوەی بەهەشتی لەسەر بێ باوەڕان حەرام کردووە...

(٥١) ئەوانەی کەکاتی خۆی ئاینەکەیان بەگەمەو گاڵتە گرتبوو، ژیانی دنیا غەڕاو سەرگەردانی کردبوون و خەڵەتاندنی، جا ئێمە ئەمڕۆ ئەوانە فەرامۆش دەکەین، هەروەکو ئەوان ئەم ڕۆژەیان فەرامۆش کرد و لەبیر خۆیان بردبۆوە، هەروەها بەهۆی ئەوەشەوە کە دژی ئایەتەکانی ئێمە دەوەستان و ئینکاری و بەربەرەکانیان دەکرد.

وَلَقَدْ جِئْنَٰهُم بِكِتَٰبٍ فَصَّلْنَٰهُ عَلَىٰ عِلْمٍ هُدًى وَرَحْمَةً لِّقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ ﴿٥٢﴾ هَلْ يَنظُرُونَ إِلَّا تَأْوِيلَهُۥ ۚ يَوْمَ يَأْتِى تَأْوِيلُهُۥ يَقُولُ ٱلَّذِينَ نَسُوهُ مِن قَبْلُ قَدْ جَآءَتْ رُسُلُ رَبِّنَا بِٱلْحَقِّ فَهَل لَّنَا مِن شُفَعَآءَ فَيَشْفَعُوا۟ لَنَآ أَوْ نُرَدُّ فَنَعْمَلَ غَيْرَ ٱلَّذِى كُنَّا نَعْمَلُ ۚ قَدْ خَسِرُوٓا۟ أَنفُسَهُمْ وَضَلَّ عَنْهُم مَّا كَانُوا۟ يَفْتَرُونَ ﴿٥٣﴾ إِنَّ رَبَّكُمُ ٱللَّهُ ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ فِى سِتَّةِ أَيَّامٍ ثُمَّ ٱسْتَوَىٰ عَلَى ٱلْعَرْشِ يُغْشِى ٱلَّيْلَ ٱلنَّهَارَ يَطْلُبُهُۥ حَثِيثًا وَٱلشَّمْسَ وَٱلْقَمَرَ وَٱلنُّجُومَ مُسَخَّرَٰتٍۭ بِأَمْرِهِۦٓ ۗ أَلَا لَهُ ٱلْخَلْقُ وَٱلْأَمْرُ ۗ تَبَارَكَ ٱللَّهُ رَبُّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٥٤﴾ ٱدْعُوا۟ رَبَّكُمْ تَضَرُّعًا وَخُفْيَةً ۚ إِنَّهُۥ لَا يُحِبُّ ٱلْمُعْتَدِينَ ﴿٥٥﴾ وَلَا تُفْسِدُوا۟ فِى ٱلْأَرْضِ بَعْدَ إِصْلَٰحِهَا وَٱدْعُوهُ خَوْفًا وَطَمَعًا ۚ إِنَّ رَحْمَتَ ٱللَّهِ قَرِيبٌ مِّنَ ٱلْمُحْسِنِينَ ﴿٥٦﴾ وَهُوَ ٱلَّذِى يُرْسِلُ ٱلرِّيَٰحَ بُشْرًۢا بَيْنَ يَدَىْ رَحْمَتِهِۦ ۖ حَتَّىٰٓ إِذَآ أَقَلَّتْ سَحَابًا ثِقَالًا سُقْنَٰهُ لِبَلَدٍ مَّيِّتٍ فَأَنزَلْنَا بِهِ ٱلْمَآءَ فَأَخْرَجْنَا بِهِۦ مِن كُلِّ ٱلثَّمَرَٰتِ ۚ كَذَٰلِكَ نُخْرِجُ ٱلْمَوْتَىٰ لَعَلَّكُمْ تَذَكَّرُونَ ﴿٥٧﴾

(٥٢) سوێند بێت بەخوا بەڕاستی ئێمە کتێبێکمان بۆ هێنان هەموو شتێکمان لەسەر بنچینەی زانستی و زانیاری تێدا ڕوون کردۆتەوە، هیدایەت و ڕەحمەت و ڕێنموویشە بۆ ئەو کەسانەی کە باوەڕی پێدەهێنن.

(٥٣) ئایا (بێ باوەڕان) چاوەڕێی چی دەکەن جگە لە پێشهاتن و ڕوودانی هەڕەشە قورئانیەکان نەبێت؟ جا ئەو ڕۆژەی کە (بەڵێن و هەڕەشەکان) دێتە دی، ئەوانەی پێشتر فەرامۆشیان کردبوو دەڵێن: بەڕاستی پێغەمبەرانی پەروەردگارمان حەقیقەت و ڕاستەقینەیان هێنابوو (کەچی ئێمە بڕوامان پێنەکردن و بەکەساسیەوە دەڵێن): ئایا ئەوە کەسێک نیە تکامان بۆ بکات؟ (بەڵکو خوا بمانبەخشێت)، یاخود بگەڕێینەوە بۆ دنیاو کارو کردەوەی چاک بکەین نەک ئەوەی کە ئەوسا دەمانکرد، بەڕاستی ئەوانە خۆیان دۆڕاندو هەرچیان هەڵبەستبوو و باوەڕیان پێی هەبوو، لێیان وون بوو.

(٥٤) بێگومان پەروەردگارتان (ﷲ) یە کە دروستکاری ئاسمانەکان و زەویە لە ماوەی شەش ڕۆژدا (مەگەر هەر خۆیشی بزانێت ئەو ڕۆژانە ماوەیان چەندە)، پاشان لەسەر عەرش و تەختی فەرمانڕەوای وەستا (ئەڵبەتە چۆنیەتی وەستان و تەختی فەرمانڕەوایەتی و گەلێ شتی لەو بابەتانە لەرادەی بۆچوونی ئێمە بەدەرە، تەفسیری ئەم ئایەتەیان لە پێشەوا مالیک و ئەحمەد پرسیووە، لە وەڵامدا وتوویانە: وەستانەکە حەقیقەتی هەیە، چۆنیەتیەکەی شاراوەیە، پرسیارکردن دەربارەی بیدعەیە، باوەڕ بوون پێی واجبە) بەشەو، ڕۆژ دادەپۆشێت؛ لەکاتێکدا بەشێنەیی عەوداڵە بەدوایدا، خۆرو مانگ و ئەستێرەکان (هەر هەموویان) بە فەرمانی خوا کەوتوونەتە گەڕو لە فەرمانی دەرناچن، ئاگادار بن و بزانن و تێبگەن کە: هەرچی دروستکردن و بڕیاردانە هەر بۆ ئەوە، (کەواتە دەبا هەمووان فەرمانبەرداری ئەو بین و لە فەرمانی دەرنەچین)، موبارەک و پیرۆزو گەورەیە زاتی (ﷲ) پەروەردگاری هەموو جیهانیان.

(٥٥) هاناو هاوار بکەن لە پەروەردگارتان بەپاڕانەوەی بەکوڵ، بەنهێنی (لەکات و شوێنی لەباردا) چونکە بەڕاستی ئەو زاتە دەست درێژکارانی خۆش ناوێت (مەبەست ئەوانەن کە هاناو هاوار بۆ غەیری خوا دەبەن).

(٥٦) (خەڵکینە) فەسادو گوناهو تاوان ئەنجام مەدەن لە زەویدا دوای ئەوەی چاکەکاریی ڕەنگی گرتووەو (خەڵکی خەریکن خووی پێوە دەگرن)، بەردەوام هاناو هاوار بۆ خوا بەرن لە ترسی سزای دۆزەخ و بەئومێدی بەدەستهێنانی بەهەشت، بەڕاستی ڕەحمەتی خوا نزیکە لە چاکەکاران و چاکەخوازانەوە.

(٥٧) هەر ئەو خوایەیە کە بای شەماڵ (هەڵگری هەڵمی ئاو) دەنێرێت لەکاتێکدا مژدەیە (بۆ خەڵک) لەنێوان دوودەستی ڕەحمەتی پەروەردگاردا، هەتا وای لێدێت کە ئەو بایە هەوری سەنگین هەڵدەگرێت، ئەوسا دەینێرین بۆ ناوچەو وڵاتێکی مردوو، جا بەهۆی ئەو ئاوەوە هەرچی بەروبوومە دەری دەهێنین، جا هەر ئابەو شێوەیە مردووانیش لەناخی زەوی دەردەهێنین و زیندوو دەکەینەوە، بۆ ئەوەی یاداوەری وەربگرن.

وَٱلۡبَلَدُ ٱلطَّيِّبُ يَخۡرُجُ نَبَاتُهُۥ بِإِذۡنِ رَبِّهِۦۖ وَٱلَّذِي خَبُثَ لَا يَخۡرُجُ
إِلَّا نَكِدٗاۚ كَذَٰلِكَ نُصَرِّفُ ٱلۡأٓيَٰتِ لِقَوۡمٖ يَشۡكُرُونَ ﴿٥٨﴾
لَقَدۡ أَرۡسَلۡنَا نُوحًا إِلَىٰ قَوۡمِهِۦ فَقَالَ يَٰقَوۡمِ ٱعۡبُدُواْ ٱللَّهَ مَا لَكُم
مِّنۡ إِلَٰهٍ غَيۡرُهُۥٓ إِنِّيٓ أَخَافُ عَلَيۡكُمۡ عَذَابَ يَوۡمٍ عَظِيمٖ ﴿٥٩﴾
قَالَ ٱلۡمَلَأُ مِن قَوۡمِهِۦٓ إِنَّا لَنَرَىٰكَ فِي ضَلَٰلٖ مُّبِينٖ ﴿٦٠﴾ قَالَ
يَٰقَوۡمِ لَيۡسَ بِي ضَلَٰلَةٞ وَلَٰكِنِّي رَسُولٞ مِّن رَّبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ
﴿٦١﴾ أُبَلِّغُكُمۡ رِسَٰلَٰتِ رَبِّي وَأَنصَحُ لَكُمۡ وَأَعۡلَمُ مِنَ ٱللَّهِ
مَا لَا تَعۡلَمُونَ ﴿٦٢﴾ أَوَعَجِبۡتُمۡ أَن جَآءَكُمۡ ذِكۡرٞ مِّن رَّبِّكُمۡ عَلَىٰ
رَجُلٖ مِّنكُمۡ لِيُنذِرَكُمۡ وَلِتَتَّقُواْ وَلَعَلَّكُمۡ تُرۡحَمُونَ ﴿٦٣﴾ فَكَذَّبُوهُ
فَأَنجَيۡنَٰهُ وَٱلَّذِينَ مَعَهُۥ فِي ٱلۡفُلۡكِ وَأَغۡرَقۡنَا ٱلَّذِينَ كَذَّبُواْ
بِـَٔايَٰتِنَآۚ إِنَّهُمۡ كَانُواْ قَوۡمًا عَمِينَ ﴿٦٤﴾ ۞ وَإِلَىٰ عَادٍ أَخَاهُمۡ
هُودٗاۚ قَالَ يَٰقَوۡمِ ٱعۡبُدُواْ ٱللَّهَ مَا لَكُم مِّنۡ إِلَٰهٍ غَيۡرُهُۥٓۚ أَفَلَا تَتَّقُونَ
﴿٦٥﴾ قَالَ ٱلۡمَلَأُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ مِن قَوۡمِهِۦٓ إِنَّا لَنَرَىٰكَ فِي
سَفَاهَةٖ وَإِنَّا لَنَظُنُّكَ مِنَ ٱلۡكَٰذِبِينَ ﴿٦٦﴾ قَالَ يَٰقَوۡمِ
لَيۡسَ بِي سَفَاهَةٞ وَلَٰكِنِّي رَسُولٞ مِّن رَّبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴿٦٧﴾



(٥٨) وولاتی بەپیت و چاك و ئاوەدان، دارو درەخت و رووەكی تێدا دەڕوێت بەفەرمانی پەروەردگاری، ئەوەش كە زۆنگ و پیس و بێ كەڵك بێت، شتی بێ سوود و بێ فەڕ نەبێت، هیچی لێ پەیدا نابێت، ئا بەو شێوەیە بەڵگەو نیشانەی جۆراو جۆر دەهێنینەوە بۆ كەسانێك كە دڵسۆزن و سوپاسی خوا دەكەن.

(٥٩) سوێند بە خوا بەڕاستی ئێمە ـ نوح ـ مان ڕەوانە كرد بۆ سەر قەومەكەی، جا ئەویش پێی وتن: ئەی گەل و هۆزم ئێوە هەر خوا بپەرستن، چونكە جگە لەو زاتە خوایەكی ترتان نیە، بەڕاستی من دەترسم لەڕۆژێكی گەورەدا تووشی بەڵاو سزایەكی زۆرسەخت ببن.

(٦٠) دەستەی دەسەڵاتداری قەومەكەی وتیان: بەڕاستی ئێمە تۆ لەنێو گومڕاییەكی ئاشكرادا دەبینین!!

(٦١) نوح وتی: ئەی قەوم و هۆزم من هیچ گومڕاییەكم نیە بەڵكو من پێغەمبەرێكم و لە لایەن پەروەردگاری جیهانیانەوە ڕەوانەكراوم...

(٦٢) پەیامەكانی پەروەردگارمتان پێ ڕادەگەیەنم، من دڵسۆزیتان لەگەڵ دەكەم، ئەوەی من دەیزانم دەربارەی گەورەیی و باڵادەستی خوا، ئێوە نایزانن...

(٦٣) ئایا ئێوە سەرسام بوون لەهاتنی بەرنامە و یادخەرەوەیەك لەلایەن پەروەردگارتانەوە بۆ سەر پیاوێكی (ڕاستگۆ) لە خۆتان؟ تا بێدارتان بكاتەوەو دینداری و خواناسی بكەن، بۆ ئەوەی سەرئەنجام ڕەحمتان پێ بكرێت.

(٦٤) (دوای ٩٥٠ ساڵ هەوڵ و كۆشش) هەر بەرنامەكەیان بە درۆزانی و بڕوایان پێ نەكرد، جا ئێمەش خۆی و ئەو ئیماندارانەی لەگەڵیدا بوون لە كەشتیەكەدا ڕزگارمان كردن و ئەوانەی بڕوایان نەهێنا بەئایەت و فەرمانەكانمان نوقمی زریانەكەمان كردن، چونكە بەڕاستی ئەوان گەلێكی كوێرو نابینا بوون (لە ئاستی ڕاستیەكاندا).

(٦٥) بۆ قەومی (عاد)یش (هود)ی برایانمان نارد (هەروەكو نوح) وتی: ئەی گەل و عەشرەتم هەر خوا بپەرستن چونكە جگە لەو زاتە خوایەكی ترتان نیە، ئایا ئەوە لە خوا ناترسن؟!

(٦٦) ئەو دەسەڵاتدارانەی كە بێ بڕوا بوون لە قەومەكەی وتیان: بەڕاستی ئێمە تۆ لە نێو نەفامیدا دەبینین (تۆ ناگۆڕێیت و پێش ناكەویت) و بەڕاستی ئێمە وادەزانین تۆ یەكێكیت لە درۆزنەكان.

(٦٧) (هود) فەرمووی: ئەی قەوم و عەشرەتم من هیچ گێلی و نەفامیەكم پێوە نیە، بەڵكو من فرستادەیەكم لەلایەن پەروەردگاری هەموو جیهانیانەوە...

أُبَلِّغُكُمْ رِسَالَاتِ رَبِّي وَأَنَا لَكُمْ نَاصِحٌ أَمِينٌ ﴿٦٨﴾ أَوَعَجِبْتُمْ أَنْ جَاءَكُمْ ذِكْرٌ مِنْ رَبِّكُمْ عَلَىٰ رَجُلٍ مِنْكُمْ لِيُنْذِرَكُمْ ۚ وَاذْكُرُوا إِذْ جَعَلَكُمْ خُلَفَاءَ مِنْ بَعْدِ قَوْمِ نُوحٍ وَزَادَكُمْ فِي الْخَلْقِ بَسْطَةً ۖ فَاذْكُرُوا آلَاءَ اللَّهِ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ ﴿٦٩﴾ قَالُوا أَجِئْتَنَا لِنَعْبُدَ اللَّهَ وَحْدَهُ وَنَذَرَ مَا كَانَ يَعْبُدُ آبَاؤُنَا ۖ فَأْتِنَا بِمَا تَعِدُنَا إِنْ كُنْتَ مِنَ الصَّادِقِينَ ﴿٧٠﴾ قَالَ قَدْ وَقَعَ عَلَيْكُمْ مِنْ رَبِّكُمْ رِجْسٌ وَغَضَبٌ ۖ أَتُجَادِلُونَنِي فِي أَسْمَاءٍ سَمَّيْتُمُوهَا أَنْتُمْ وَآبَاؤُكُمْ مَا نَزَّلَ اللَّهُ بِهَا مِنْ سُلْطَانٍ ۚ فَانْتَظِرُوا إِنِّي مَعَكُمْ مِنَ الْمُنْتَظِرِينَ ﴿٧١﴾ فَأَنْجَيْنَاهُ وَالَّذِينَ مَعَهُ بِرَحْمَةٍ مِنَّا وَقَطَعْنَا دَابِرَ الَّذِينَ كَذَّبُوا بِآيَاتِنَا ۖ وَمَا كَانُوا مُؤْمِنِينَ ﴿٧٢﴾ وَإِلَىٰ ثَمُودَ أَخَاهُمْ صَالِحًا ۗ قَالَ يَا قَوْمِ اعْبُدُوا اللَّهَ مَا لَكُمْ مِنْ إِلَٰهٍ غَيْرُهُ ۖ قَدْ جَاءَتْكُمْ بَيِّنَةٌ مِنْ رَبِّكُمْ ۖ هَٰذِهِ نَاقَةُ اللَّهِ لَكُمْ آيَةً ۖ فَذَرُوهَا تَأْكُلْ فِي أَرْضِ اللَّهِ ۖ وَلَا تَمَسُّوهَا بِسُوءٍ فَيَأْخُذَكُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿٧٣﴾

(٦٨) پەیامەکانی پەروەردگاری خۆمتان پێ رادەگەیەنم و من بۆ ئێوە دڵسۆزو ئەمینم.

(٦٩) ئایا ئێوە سەرسام بوون لە هاتنی بەرنامە و یادخەرەوەیەک لەلایەن پەروەردگارتانەوە بۆ سەر پیاوێکی (ڕاستگۆ) لە خۆتان؟ تا بێدارتان بکاتەوە، جا یادی ئەو کاتە بکەنەوە کە خوا ئێوەی کردە جێنشین لە دوای قەومی نوح، لە ڕووی جەستەوە زیاد لەوان گەورە و تێرو تەواو بەدیهێنان کەواتە یادی نازو نیعمەتەکانی خوا بکەن بۆ ئەوەی سەرفراز بن.

(٧٠) (کەچی قەومی نالەبار لە وەڵامیدا) وتیان: ئایا تۆ هاتویتە لامان بۆ ئەوەی تەنها خوا بپەرستین و واز لەو پەرستراوانە بهێنین (کە ساڵەهایە) باو و باپیرانمان دەیانپەرستن؟! (بە گاڵتە و بێ باوەڕیەوە وتیان): کەوابوو ئەگەر تۆ لە ڕاستگۆیانیت ئەو بەڵێنانەی کە پێمان دەدەیت بۆمان پێش بهێنە!!

(٧١) هود فەرمووی: ئیتر ئەوە بەڵاو ناخۆشی و خەشمی خوا کەوتە سەرتان، ئایا ئەوە ڕاستە ئێوە موجادەلەو دەمە دەمێم لەگەڵ دەکەن لەسەر کۆمەڵێک بت و پەیکەر کە خۆتان و باوو باپیرانتان ناوتان ناون؟ بێگومان هیچ پەیوەندیەکیان بە خواوە نیە، هیچ بەڵگەیەک لەلایەن خواوە دانەبەزیوە کە ئەوانە بچوکترین کاریان بەدەست بێت، ئێوە چاوەڕێ بن، منیش لەگەڵتاندا لە چاوەڕوانانم.

(٧٢) ئینجا (دوای دابەزینی خەشمی خوایی) هودو ئەو ئیماندارانەی لەگەڵی بوون، بەرەحمەتێکی تایبەتی خۆمان، ڕزگارمان کردن، ئەوانەش کە ئایەت و هەڕەشەکانی ئێمەیان بەدرۆ دەزانی دوابڕاومان کردن و ئەوانەش باوەڕدار نەبوون بە مژدەکانمان.

(٧٣) بۆ سەر قەومی (ثمود) یش (صالح) ی برایانمان نارد (ئەویش پێی وتن): ئەی گەلەکەم خوا بپەرستن چونکە جگە لەو خوایەکی ترتان نیە، ئەوەتا بەڕاستی موعجیزەی ئاشکراتان لەلایەن پەروەردگارتانەوە بۆ هاتووە، ئەمە وشترێکە لەلایەن خواوە بەتایبەت بۆ ئێوەی بەدیهێناوە (لەسەر داخوازیی خۆتان) کە موعجیزەیەکی ئاشکرایە، وازی لێ بهێنن با بلەوەڕێت لە زەوی خوادا و دەست درێژی مەکەنە سەرو ئازاری مەدەن (چونکە هەر ئازارتاندا) سزاو بەلایەکی بەئێش و ئازار داوێن گیرتان دەبێت.

وَٱذْكُرُوٓا۟ إِذْ جَعَلَكُمْ خُلَفَآءَ مِنۢ بَعْدِ عَادٍ وَبَوَّأَكُمْ فِى ٱلْأَرْضِ تَتَّخِذُونَ مِن سُهُولِهَا قُصُورًا وَتَنْحِتُونَ ٱلْجِبَالَ بُيُوتًا ۖ فَٱذْكُرُوٓا۟ ءَالَآءَ ٱللَّهِ وَلَا تَعْثَوْا۟ فِى ٱلْأَرْضِ مُفْسِدِينَ ﴿٧٤﴾ قَالَ ٱلْمَلَأُ ٱلَّذِينَ ٱسْتَكْبَرُوا۟ مِن قَوْمِهِۦ لِلَّذِينَ ٱسْتُضْعِفُوا۟ لِمَنْ ءَامَنَ مِنْهُمْ أَتَعْلَمُونَ أَنَّ صَٰلِحًا مُّرْسَلٌ مِّن رَّبِّهِۦ ۚ قَالُوٓا۟ إِنَّا بِمَآ أُرْسِلَ بِهِۦ مُؤْمِنُونَ ﴿٧٥﴾ قَالَ ٱلَّذِينَ ٱسْتَكْبَرُوٓا۟ إِنَّا بِٱلَّذِىٓ ءَامَنتُم بِهِۦ كَٰفِرُونَ ﴿٧٦﴾ فَعَقَرُوا۟ ٱلنَّاقَةَ وَعَتَوْا۟ عَنْ أَمْرِ رَبِّهِمْ وَقَالُوا۟ يَٰصَٰلِحُ ٱئْتِنَا بِمَا تَعِدُنَآ إِن كُنتَ مِنَ ٱلْمُرْسَلِينَ ﴿٧٧﴾ فَأَخَذَتْهُمُ ٱلرَّجْفَةُ فَأَصْبَحُوا۟ فِى دَارِهِمْ جَٰثِمِينَ ﴿٧٨﴾ فَتَوَلَّىٰ عَنْهُمْ وَقَالَ يَٰقَوْمِ لَقَدْ أَبْلَغْتُكُمْ رِسَالَةَ رَبِّى وَنَصَحْتُ لَكُمْ وَلَٰكِن لَّا تُحِبُّونَ ٱلنَّٰصِحِينَ ﴿٧٩﴾ وَلُوطًا إِذْ قَالَ لِقَوْمِهِۦٓ أَتَأْتُونَ ٱلْفَٰحِشَةَ مَا سَبَقَكُم بِهَا مِنْ أَحَدٍ مِّنَ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٨٠﴾ إِنَّكُمْ لَتَأْتُونَ ٱلرِّجَالَ شَهْوَةً مِّن دُونِ ٱلنِّسَآءِ ۚ بَلْ أَنتُمْ قَوْمٌ مُّسْرِفُونَ ﴿٨١﴾

(٧٤) یادی ئەو کاتەش بکەنەوە کە خوا ئێوەی کردە جێنشین لە دوای قەومی عاد، ژیانی لەسەر زەویدا بۆ ئاسان کردن، لە دەشتەکاندا کۆشک و تەلار دروست دەکەن، لە شاخ و کێوەکانیشدا ژوور دادەتاشن، کەواتە یادی نازو نیعمەتەکانی خوا بکەن و تۆوی خراپە و فەسادو گوناھ لەسەر زەویدا مەچێنن.

(٧٥) (دوای ئەو یادخستنەوانەی صالح پێغەمبەر) دەستەی دەسەڵاتداران، ئەوانەی لووت بەرزیان کرد لە قەومەکەی وتیان بەوانەی کە چەوسێنراونەتەوە، لەوانەیان کە باوەڕیان هێناوە: باشە ئێوە دەزانن کە صالح لەلایەن پەروەردگاریەوە رەوانە کراوە؟! ئیمانداران وتیان: بە دڵنیاییەوە ئێمە باوەڕدارین بەو پەیامەی کە بەودا رەوانە کراوە.

(٧٦) (بەڵام) ئەوانەی کە خۆیان بەزل و گەورە دەزانی وتیان: بەڕاستی ئێمە بێ بڕواین بەوەی ئێوە بڕواتان پێ هێناوە!

(٧٧) یەکسەر (چوون) وشترەکەیان سەربڕی و لە فەرمانی پەروەردگاریان یاخی بوون و وتیان: ئەی صالح ئەگەر تۆ لە پێغەمبەرانیت ئادەی ئەو هەڕەشانەی کە لێمان دەیکەیت بۆمان پێش بهێنە.

(٧٨) ئینجا یەکسەر (دوای سەربڕینی وشترەکە) بوومەلەرزەیەک و دەنگێکی سامناک گرتنی و پێچانیەوە و دوا بە دوای ئەوە هەموو لە ماڵەکانیاندا بەچۆکدا هاتن و هێزی ئەژنۆیان شکاو تیاچوون.

(٧٩) (جا صالح پێغەمبەر، پشتی لێهەڵکردن) و وتی: ئەی قەوم و عەشرەتم سوێند بە خوا بەڕاستی پەیامی پەروەردگارم بەچاکی پێراگەیاندن و دڵسۆزیم لەگەڵ کردن، بەڵام (بەداخەوە) ئێوە دڵسۆزانتان خۆش ناوێت.

(٨٠) یادی (لوط پێغەمبەریش) بکە کاتێک بە قەومەکەی وت: چۆن ئێوە گوناهو تاوانێکی وا دەکەن کە تا ئێستا هیچ کەس پێش ئێوە لە جیهاندا گوناهو تاوانی وای نەکردوە؟!

(٨١) چونکە بەڕاستی ئێوە ئارەزووی (جنسی) خۆتان لەگەڵ پیاواندا ئەنجام دەدەن لەباتی ژنانی هاوسەرتان، نەخێر ئێوە قەومێکی ناپوخت و سنوور بەزێن و زیادەڕەون.

وَمَا كَانَ جَوَابَ قَوْمِهِۦٓ إِلَّآ أَن قَالُوٓا۟ أَخْرِجُوهُم مِّن قَرْيَتِكُمْ ۖ إِنَّهُمْ أُنَاسٌ يَتَطَهَّرُونَ ﴿٨٢﴾ فَأَنجَيْنَٰهُ وَأَهْلَهُۥٓ إِلَّا ٱمْرَأَتَهُۥ كَانَتْ مِنَ ٱلْغَٰبِرِينَ ﴿٨٣﴾ وَأَمْطَرْنَا عَلَيْهِم مَّطَرًا ۖ فَٱنظُرْ كَيْفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلْمُجْرِمِينَ ﴿٨٤﴾ وَإِلَىٰ مَدْيَنَ أَخَاهُمْ شُعَيْبًا ۗ قَالَ يَٰقَوْمِ ٱعْبُدُوا۟ ٱللَّهَ مَا لَكُم مِّنْ إِلَٰهٍ غَيْرُهُۥ ۖ قَدْ جَآءَتْكُم بَيِّنَةٌ مِّن رَّبِّكُمْ ۖ فَأَوْفُوا۟ ٱلْكَيْلَ وَٱلْمِيزَانَ وَلَا تَبْخَسُوا۟ ٱلنَّاسَ أَشْيَآءَهُمْ وَلَا تُفْسِدُوا۟ فِى ٱلْأَرْضِ بَعْدَ إِصْلَٰحِهَا ۚ ذَٰلِكُمْ خَيْرٌ لَّكُمْ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ ﴿٨٥﴾ وَلَا تَقْعُدُوا۟ بِكُلِّ صِرَٰطٍ تُوعِدُونَ وَتَصُدُّونَ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ مَنْ ءَامَنَ بِهِۦ وَتَبْغُونَهَا عِوَجًا ۚ وَٱذْكُرُوٓا۟ إِذْ كُنتُمْ قَلِيلًا فَكَثَّرَكُمْ ۖ وَٱنظُرُوا۟ كَيْفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلْمُفْسِدِينَ ﴿٨٦﴾ وَإِن كَانَ طَآئِفَةٌ مِّنكُمْ ءَامَنُوا۟ بِٱلَّذِىٓ أُرْسِلْتُ بِهِۦ وَطَآئِفَةٌ لَّمْ يُؤْمِنُوا۟ فَٱصْبِرُوا۟ حَتَّىٰ يَحْكُمَ ٱللَّهُ بَيْنَنَا ۚ وَهُوَ خَيْرُ ٱلْحَٰكِمِينَ ﴿٨٧﴾

(٨٢) وەڵامی قەومە نالەبارەکەی تەنها ئەوە بوو کە وتیان: ئەوانە شار بەدەرکەن چونکە ئەوانە کەسانێکن خۆیان پاک ڕادەگرن (داوێن پاکن و وەک ئێمە ناکەن)!!

(٨٣) ئێمەش لوط و خانەوادەکەیمان ڕزگار کرد، جگە لە هاوسەرەکەی، چونکە ئەویش لەو کەسانە بوو کە تیاچوون (لەبەر ئەوەی باوەڕی بە لوط پێغەمبەر نەبوو).

(٨٤) ئەوسا (بەردمان) بەسەرداباراندن، جا تەماشا بکەو سەرنج بدەو پەند وەرگرەو بزانە، سەرئەنجامی تاوانباران وبێ ڕەوشتان چۆن بوو.

(٨٥) بۆ هۆزی مەدیەنیش (شعیب)ی برایانمان نارد، ئەویش پێی وتن: ئەی قەوم و هۆزو گەلم تەنها خوا بپەرستن، چونکە جگە لەو زاتە خوایەکی ترتان نیە، ئەوەتە بەڕاستی بەڵگەو نیشانەی ڕوونتان لەلایەن پەروەردگارتانەوە بۆ هاتووە، کەوابوو لە کێشانە و پێوانەدا (فێڵ و تەڵەکە مەکەن) و مافی خۆی بدەنێ، شتی خەڵکی سووک مەکەن و بێ نرخ تەماشای مەکەن، تۆوی فەساد و تاوانباری و گوناهـ لە زەویدا مەچێنن دوای چاکساز بوونی، ئەوانە چاکترە بۆتان ئەگەر ئێوە باوەڕدارن.

(٨٦) هەروەها لەسەر هیچ ڕێگەیەک دامەنیشن هەڕەشە لە خەڵکی بکەن و ئەوانەی کە باوەڕیان هێناوە بەخوا قەدەغەیان بکەن لەگرتنی ڕێبازی خواو بتانەوێت ڕێبازی خوا بەلاری و لەوێری پیشان بدرێت و پیادە بکەن، یادی ئەو کاتەش بکەن کە کەم و لاواز بوون، ئینجا خوا زۆرو بەهێزی کردن، تەماشا بکەن و سەرنج بدەن و بزانن چۆن بوو سەرەئەنجامی ئەوانەی چێنەری تۆوی خراپەن.

(٨٧) خۆ ئەگەر دەستەیەک لە ئێوە باوەڕی هێنابێت بەو بەرنامەیەی کە پێی ڕەوانە کراوم و ئەگەر دەستەیەکیش باوەڕیان نەهێنا بوو، ئەوە خۆتان بگرن و چاوەڕێ بن هەتا خوا خۆی داوەری دەکات لە نێوانمانداو هەر ئەو زاتە خۆی چاکترینی دادوەرانە.



﴿قَالَ ٱلْمَلَأُ ٱلَّذِينَ ٱسْتَكْبَرُوا۟ مِن قَوْمِهِۦ لَنُخْرِجَنَّكَ يَٰشُعَيْبُ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ مَعَكَ مِن قَرْيَتِنَآ أَوْ لَتَعُودُنَّ فِى مِلَّتِنَا ۚ قَالَ أَوَلَوْ كُنَّا كَٰرِهِينَ ﴿٨٨﴾ قَدِ ٱفْتَرَيْنَا عَلَى ٱللَّهِ كَذِبًا إِنْ عُدْنَا فِى مِلَّتِكُم بَعْدَ إِذْ نَجَّىٰنَا ٱللَّهُ مِنْهَا ۚ وَمَا يَكُونُ لَنَآ أَن نَّعُودَ فِيهَآ إِلَّآ أَن يَشَآءَ ٱللَّهُ رَبُّنَا ۚ وَسِعَ رَبُّنَا كُلَّ شَىْءٍ عِلْمًا ۚ عَلَى ٱللَّهِ تَوَكَّلْنَا ۚ رَبَّنَا ٱفْتَحْ بَيْنَنَا وَبَيْنَ قَوْمِنَا بِٱلْحَقِّ وَأَنتَ خَيْرُ ٱلْفَٰتِحِينَ ﴿٨٩﴾ وَقَالَ ٱلْمَلَأُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ مِن قَوْمِهِۦ لَئِنِ ٱتَّبَعْتُمْ شُعَيْبًا إِنَّكُمْ إِذًا لَّخَٰسِرُونَ ﴿٩٠﴾ فَأَخَذَتْهُمُ ٱلرَّجْفَةُ فَأَصْبَحُوا۟ فِى دَارِهِمْ جَٰثِمِينَ ﴿٩١﴾ ٱلَّذِينَ كَذَّبُوا۟ شُعَيْبًا كَأَن لَّمْ يَغْنَوْا۟ فِيهَا ۚ ٱلَّذِينَ كَذَّبُوا۟ شُعَيْبًا كَانُوا۟ هُمُ ٱلْخَٰسِرِينَ ﴿٩٢﴾ فَتَوَلَّىٰ عَنْهُمْ وَقَالَ يَٰقَوْمِ لَقَدْ أَبْلَغْتُكُمْ رِسَٰلَٰتِ رَبِّى وَنَصَحْتُ لَكُمْ ۖ فَكَيْفَ ءَاسَىٰ عَلَىٰ قَوْمٍ كَٰفِرِينَ ﴿٩٣﴾ وَمَآ أَرْسَلْنَا فِى قَرْيَةٍ مِّن نَّبِىٍّ إِلَّآ أَخَذْنَآ أَهْلَهَا بِٱلْبَأْسَآءِ وَٱلضَّرَّآءِ لَعَلَّهُمْ يَضَّرَّعُونَ ﴿٩٤﴾ ثُمَّ بَدَّلْنَا مَكَانَ ٱلسَّيِّئَةِ ٱلْحَسَنَةَ حَتَّىٰ عَفَوا۟ وَّقَالُوا۟ قَدْ مَسَّ ءَابَآءَنَا ٱلضَّرَّآءُ وَٱلسَّرَّآءُ فَأَخَذْنَٰهُم بَغْتَةً وَهُمْ لَا يَشْعُرُونَ ﴿٩٥﴾

(٨٨) دەستەی دەسەلاتداران، ئەوانەی لووت بەرزیان کرد لە قەومەکەی وتیان: ئەی شوعەیب سوێند بە خوا خۆت و ئەوانەی باوەڕیان هێناوە لەگەڵتدا لە شارەکەماندا دەرتان دەکەین، یان بە ئارەزووی خۆتان بگەڕێنەوە نێو ئاینەکەمان، ئیمانداران وتیان: ئایا ئەگەر حەزیشی لێ نەکەین بەدڵیشمان نەبێت؟!

(٨٩) بەڕاستی ئێمە درۆمان بەناوی خواوە هەڵبەستووە، ئەگەر پەشیمان ببینەوە و بگەڕێینەوە ناو ئاینەکەی ئێوە، دوای ئەوەی کە خوا لە دەست (ئەو خورافاتە) ڕزگاری کردین، ئێمە بۆمان نیە بگەڕێینەوە بۆ ناو ئاینی ئێوە مەگەر ویستی خوای پەروەردگارمانی لەسەر بێت، زانست و زانیاری پەروەردگارمان فراوانە هەموو شتێکی گرتۆتەوە، هەر بەخوا پشت و پەنامان بەستووە، پەروەردگارا خۆت داوەری بکە لەسەربنچینەی حق وڕاستی لەنێوان ئێمە و قەوم وگەلماندا، چونکە تۆ چاکترینی دادوەرانی.

(٩٠) دەستەی دەسەلاتداران لە گەلی شوعەیب ئەوانەی کە بێباوەڕ بوون وتیان: سوێند بە خوا ئەگەر ئێوە شوێنی شوعەیب بکەون، بەڕاستی ئەو کاتە ئێوە لە زەرەرمەندانن.

(٩١) ئینجا یەکسەر بوومەلەرزەیەک و دەنگێکی سامناک گرتنی و پێچانیەوە و دوابەدوای ئەوە هەموو لە ماڵەکانیاندا بە چۆکدا هاتن و هێزی ئەژنۆیان شکاو تیاچوون.

(٩٢) ئەوانەی کە بەرنامەی شوعەیبیان بەدرۆزانی و باوەڕیان پێی نەبوو (لەناو بران) هەروەک لەو ناوەدا نەبووبن و نەژیابن وابوو، ئەوانەی کە شوعەیبیان بەدرۆزانی و باوەڕیان پێی نەبوو تەنها ئەوان زەرەرمەند و ماڵوێران بوون.

(٩٣) جا شوعەیب پێغەمبەر، پشتی لێهەڵکردن و وتی: ئەی قەوم و عەشرەتم سوێند بە خوا بەڕاستی پەیامەکانی پەروەردگارم بەچاکی پێڕاگەیاندن و دڵسۆزیم لەگەڵ کردن، ئیتر من چۆن خەم بخۆم بۆ قەومێک کە بێ باوەڕن.

(٩٤) لە هیچ شارو وڵاتێکدا هیچ پێغەمبەرێکمان نەناردوە (کە خەڵکەکەی بەدرۆیان زانی بێت و بەگوێیان نەکردبێت) مەگەر خەڵکی ئەو شوێنەمان بەتەنگانە و نەخۆشی گیرۆدە کردوە، بۆ ئەوەی (دابچڵەکێن و تێفکرن)و دەست بکەن بەنزاو پاڕانەوەو لالانەوە.

(٩٥) پاشان شوێنی تەنگانەو ناخۆشیەکەمان گۆڕی بەشوێنی خۆشی و کامەرانی، هەتا بەتەواوی لە هەموو ڕویەکەوە زیادیان کردو کەوتنە خۆشیەوە و (وایان لێهات کە خۆشی و ناخۆشی بەتاقیکردنەوە دانەنێن) جا وتیان: بەڕاستی ناخۆشی و خۆشی تووشی باوو باپیرانیشمان بووە (ئەمە شتێکی ئاساییە!!) ئێمەش کتوپڕ گرتمانن لەکاتێکدا ئەوان هەستیان بە خۆیان نەکرد لەناومان بردن و تەخت و تاراجیانمان تێکدا.

وَلَوْ أَنَّ أَهْلَ ٱلْقُرَىٰٓ ءَامَنُواْ وَٱتَّقَوْاْ لَفَتَحْنَا عَلَيْهِم بَرَكَـٰتٍ مِّنَ ٱلسَّمَآءِ وَٱلْأَرْضِ وَلَـٰكِن كَذَّبُواْ فَأَخَذْنَـٰهُم بِمَا كَانُواْ يَكْسِبُونَ ﴿٩٦﴾ أَفَأَمِنَ أَهْلُ ٱلْقُرَىٰٓ أَن يَأْتِيَهُم بَأْسُنَا بَيَـٰتًا وَهُمْ نَآئِمُونَ ﴿٩٧﴾ أَوَأَمِنَ أَهْلُ ٱلْقُرَىٰٓ أَن يَأْتِيَهُم بَأْسُنَا ضُحًى وَهُمْ يَلْعَبُونَ ﴿٩٨﴾ أَفَأَمِنُواْ مَكْرَ ٱللَّهِ ۚ فَلَا يَأْمَنُ مَكْرَ ٱللَّهِ إِلَّا ٱلْقَوْمُ ٱلْخَـٰسِرُونَ ﴿٩٩﴾ أَوَلَمْ يَهْدِ لِلَّذِينَ يَرِثُونَ ٱلْأَرْضَ مِنۢ بَعْدِ أَهْلِهَآ أَن لَّوْ نَشَآءُ أَصَبْنَـٰهُم بِذُنُوبِهِمْ ۚ وَنَطْبَعُ عَلَىٰ قُلُوبِهِمْ فَهُمْ لَا يَسْمَعُونَ ﴿١٠٠﴾ تِلْكَ ٱلْقُرَىٰ نَقُصُّ عَلَيْكَ مِنْ أَنۢبَآئِهَا ۚ وَلَقَدْ جَآءَتْهُمْ رُسُلُهُم بِٱلْبَيِّنَـٰتِ فَمَا كَانُواْ لِيُؤْمِنُواْ بِمَا كَذَّبُواْ مِن قَبْلُ ۚ كَذَٰلِكَ يَطْبَعُ ٱللَّهُ عَلَىٰ قُلُوبِ ٱلْكَـٰفِرِينَ ﴿١٠١﴾ وَمَا وَجَدْنَا لِأَكْثَرِهِم مِّنْ عَهْدٍ ۖ وَإِن وَجَدْنَآ أَكْثَرَهُمْ لَفَـٰسِقِينَ ﴿١٠٢﴾ ثُمَّ بَعَثْنَا مِنۢ بَعْدِهِم مُّوسَىٰ بِـَٔايَـٰتِنَآ إِلَىٰ فِرْعَوْنَ وَمَلَإِيْهِۦ فَظَلَمُواْ بِهَا ۖ فَٱنظُرْ كَيْفَ كَانَ عَـٰقِبَةُ ٱلْمُفْسِدِينَ ﴿١٠٣﴾ وَقَالَ مُوسَىٰ يَـٰفِرْعَوْنُ إِنِّى رَسُولٌ مِّن رَّبِّ ٱلْعَـٰلَمِينَ ﴿١٠٤﴾

(٩٦) خۆ ئەگەر خەڵکی شارەکان بەڕاستی باوەڕیان بهێنایەو خۆیان بپاراستایە، ئەوا بێگومان ئێمە دەرگای فەرو بەرەکەتی ئاسمان و زەوییان لەسەر دەکردنەوە، بەڵام ئەوان کە پەیام و پێغەمبەرانی ئێمەیان بەدرۆزانی، جا ئێمەش بەهۆی ئەو کاروکردەوانەی کە دەیانکرد گرتمانن و لەناومان بردن.

(٩٧) جا ئایا خەڵکی شارەکان لەوە دڵیان و ناترسن کە تۆڵەی ئێمە بێت بۆیان لە شەودا لە کاتێکدا کە ئەوان نوستوون؟!

(٩٨) ئایا خەڵکی شارەکان دڵنیاشن و ناترسن لەوەی کە تۆڵەی ئێمە بێت بۆیان لە چێشتەنگاودا، لەکاتێکدا ئەوان سەرگەرمی یاری و گەمەن.

(٩٩) جا ئایا دڵنیاو بێباک بوون لە نەخشەو پلانی خوا (لەسەر ئاستی تاک و کۆمەڵ یان لەسەر ئاستی حکومەت و گەلان)؟! جا کەس بێباک نابێت لە نەخشە و پلانی خوا جگە لە قەومی خەسارەتمەندان نەبێت.

(١٠٠) ئایا دەریشنەکەوت بۆ ئەوانەی دێن بەدوای دەستەو چینەکانی پێش خۆیان پاش لەناوچوونی ئەوانەی کە تیایدا نیشتەجێ بوون کە ئەگەر بمانویستایە، ئەوە بەهۆی گوناهەکانیانەوە تووشمان دەکردن (وەک چۆن خەڵکانی پێش خۆیانمان لەناو برد)و مۆرمان دەنا بەسەر دڵەکانیاندا، جا ئەوان نابیستن.

(١٠١) (ئەی محمد ﷺ) ئەو شارو ناوچانە هەندێک لە هەواڵ و بەسەرهاتەکانیان بۆ دەگێڕینەوە، سوێند بەخوا بێگومان پێغەمبەرانیان بۆ هات، هاوڕێ لەگەڵ چەندەها موعجیزەدا، ئیتر وەنەبێت ئەوانە باوەڕیان هێنابێت بەوەی کە پێشتر بڕوایان پێی نەبوو، ئا بەو شێوەیە خوا مۆر دەنێت بەسەر دڵی بێ باوەڕاندا.

(١٠٢) بەشی زۆری ئەو خەڵکە سەرگەردانەمان دەست نەکەوت کە پەیمان شکێن نەبن و بەڕاستی زۆربەی ئەوانەمان بەدەرچوو لە ئاینی خوا دەستکەوت.

(١٠٣) پاشان لە دوای ئەو (پێغەمبەرانەی کە باسکران) موسامان هاوڕێ لەگەڵ موعجیزەی جۆراو جۆردا بۆ سەر فیرعەون و دارو دەستەکەی رەوانەکرد، کەچی ستەمیان لەخۆیان کردو پێی بێ باوەڕ بوون، جا تەماشا بکە و ببینە بزانە چۆن بوو سەرئەنجامی ئەوانەی کە چێنەری تۆوی خراپە بوون.

(١٠٤) موسا وتی: ئەی فیرعەون چاک بزانە و دڵنیابە کە من رەوانە کراوو فرستادەم لەلایەن پەروەردگاری جیهانیانەوە...

حَقِيقٌ عَلَىٰٓ أَن لَّآ أَقُولَ عَلَى ٱللَّهِ إِلَّا ٱلْحَقَّ ۚ قَدْ جِئْتُكُم بِبَيِّنَةٍ مِّن رَّبِّكُمْ فَأَرْسِلْ مَعِىَ بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ ﴿١٠٥﴾ قَالَ إِن كُنتَ جِئْتَ بِـَٔايَةٍ فَأْتِ بِهَآ إِن كُنتَ مِنَ ٱلصَّٰدِقِينَ ﴿١٠٦﴾ فَأَلْقَىٰ عَصَاهُ فَإِذَا هِىَ ثُعْبَانٌ مُّبِينٌ ﴿١٠٧﴾ وَنَزَعَ يَدَهُۥ فَإِذَا هِىَ بَيْضَآءُ لِلنَّٰظِرِينَ ﴿١٠٨﴾ قَالَ ٱلْمَلَأُ مِن قَوْمِ فِرْعَوْنَ إِنَّ هَٰذَا لَسَٰحِرٌ عَلِيمٌ ﴿١٠٩﴾ يُرِيدُ أَن يُخْرِجَكُم مِّنْ أَرْضِكُمْ ۖ فَمَاذَا تَأْمُرُونَ ﴿١١٠﴾ قَالُوٓا۟ أَرْجِهْ وَأَخَاهُ وَأَرْسِلْ فِى ٱلْمَدَآئِنِ حَٰشِرِينَ ﴿١١١﴾ يَأْتُوكَ بِكُلِّ سَٰحِرٍ عَلِيمٍ ﴿١١٢﴾ وَجَآءَ ٱلسَّحَرَةُ فِرْعَوْنَ قَالُوٓا۟ إِنَّ لَنَا لَأَجْرًا إِن كُنَّا نَحْنُ ٱلْغَٰلِبِينَ ﴿١١٣﴾ قَالَ نَعَمْ وَإِنَّكُمْ لَمِنَ ٱلْمُقَرَّبِينَ ﴿١١٤﴾ قَالُوا۟ يَٰمُوسَىٰٓ إِمَّآ أَن تُلْقِىَ وَإِمَّآ أَن نَّكُونَ نَحْنُ ٱلْمُلْقِينَ ﴿١١٥﴾ قَالَ أَلْقُوا۟ ۖ فَلَمَّآ أَلْقَوْا۟ سَحَرُوٓا۟ أَعْيُنَ ٱلنَّاسِ وَٱسْتَرْهَبُوهُمْ وَجَآءُو بِسِحْرٍ عَظِيمٍ ﴿١١٦﴾ ۞ وَأَوْحَيْنَآ إِلَىٰ مُوسَىٰٓ أَنْ أَلْقِ عَصَاكَ ۖ فَإِذَا هِىَ تَلْقَفُ مَا يَأْفِكُونَ ﴿١١٧﴾ فَوَقَعَ ٱلْحَقُّ وَبَطَلَ مَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴿١١٨﴾ فَغُلِبُوا۟ هُنَالِكَ وَٱنقَلَبُوا۟ صَٰغِرِينَ ﴿١١٩﴾ وَأُلْقِىَ ٱلسَّحَرَةُ سَٰجِدِينَ ﴿١٢٠﴾



(١٠٥) هەمیشە سوورم لەسەر ئەوەی هیچ شتێک نەڵێم بەناوی خواوە جگە لەوەی حەق و ڕاست نەبێت، بەڕاستی بەبەڵگەیەکی ڕوونەوە لەلایەن پەروەردگارەوە هاتووم بۆ لاتان : کەواتە (ئەی فیرعەون) داواکارم ئەوەی ئیسرائیل ئازاد بکەیت، با لەگەڵ مندا بن و (دەست مەهێنە ڕێگەیان).

(١٠٦) (فیرعەون بڕوای نەکرد)و وتی: ئەگەر بەڵگەیەکت هێناوە، دە بیخەرە ڕوو، ئەگەر تۆ لە ڕاستگۆیانیت.

(١٠٧) ئینجا موسا دارعاساکەی فڕێداو دەستبەجێ بوو بەمارێکی گەورە و ئاشکرا.

(١٠٨) دەستیشی(خستە بن باڵی)ودەری هێنایەوە خێرابوو بە(کافوری) سپی و بریقەی دەدایەوە بۆ تەماشاکەران.

(١٠٩) هەندێک لە دەسەڵاتدارانی دارو دەستەی فیرعەون وتیان: بەڕاستی ئەمە جادووگەرێکی زۆر زانایە!!

(١١٠)(بەم شتانە)دەیەوێت لەوڵات و نیشتمانتان دەرتانبپەڕێنێت، جا چ فەرمانێک دەدەن؟!

(١١١) وتیان:جارێ وازی لێبهێنە لەگەڵ براکەیدا و چەند پیاوێک بنێرە لە شارەکاندا تا هەموو جادووگەران کۆ بکەنەوە ...

(١١٢) هەوڵ بدەن هەموو جادووگەرێکی زاناو شارەزات بۆ پەیدا بکەن.

(١١٣) (دوای چەند ڕۆژێک) جادووگەران هاتن بۆ لای فیرعەون وتیان: پاداشتێک، شاباشێکمان دەست دەکەوێت ئەگەر ئێمە (لەم ململانێیەدا) بردمانەوە؟!

(١١٤) (فیرعەون) وتی: بەڵێ (ئەی چۆن) ئێوە لە نزیکان و بەڕێزان دەبن.

(١١٥) ئەوسا جادووگەران وتیان: ئەی موسا، یان ئەوەیە تۆ دەست بەکار دەبیت و دایدەبەزێنیت یان ئێمە دەستبەکار دەبین هەمیشە دایدەبەزێنین.

(١١٦) موسا وتی: دە ئێوە دەست بەکاربن و دایبەزێنن، جا کاتێک دایانبەزاند، جادوویان لە چاوی خەڵکی کردو ویستیان بیانترسێن و جادوویەکی زۆر گەورەیان پێش هێناو بەرپاکرد.

(١١٧) ئێمەش نیگامان نارد بۆ موسا کە دارعاساکەت فڕێ بدە، جا دەستبەجێ (هەر کە فڕێیدا) ئەو فڕو فێڵەی کە دەیانکرد هەمووی هەڵلووشی.

(١١٨) ئەوسا ئیتر حەق چەسپاو دەرکەوت و پووچەڵیش بوەوە ئەوەی ئەوان دەیانکرد.

(١١٩) ئیتر لەو گۆڕەپانەدا (فیرعەون و دارودەستەکەی) شکستیان پێهێنراو بەسەر شۆڕیی و شەرمەزاری گەڕانەوە.

(١٢٠)(کاتێک دڵنیابوون ئەوە موعجیزەیەو لەدەسەڵاتی ئادەمیزادا نیە) جادووگەران خران بەڕوودا سوژدەبەر بوون بۆخوا.

قَالُوٓا۟ ءَامَنَّا بِرَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿١٢١﴾ رَبِّ مُوسَىٰ وَهَٰرُونَ ﴿١٢٢﴾ قَالَ فِرْعَوْنُ ءَامَنتُم بِهِۦ قَبْلَ أَنْ ءَاذَنَ لَكُمْ ۖ إِنَّ هَٰذَا لَمَكْرٌ مَّكَرْتُمُوهُ فِى ٱلْمَدِينَةِ لِتُخْرِجُوا۟ مِنْهَآ أَهْلَهَا ۖ فَسَوْفَ تَعْلَمُونَ ﴿١٢٣﴾ لَأُقَطِّعَنَّ أَيْدِيَكُمْ وَأَرْجُلَكُم مِّنْ خِلَٰفٍ ثُمَّ لَأُصَلِّبَنَّكُمْ أَجْمَعِينَ ﴿١٢٤﴾ قَالُوٓا۟ إِنَّآ إِلَىٰ رَبِّنَا مُنقَلِبُونَ ﴿١٢٥﴾ وَمَا تَنقِمُ مِنَّآ إِلَّآ أَنْ ءَامَنَّا بِـَٔايَٰتِ رَبِّنَا لَمَّا جَآءَتْنَا ۚ رَبَّنَآ أَفْرِغْ عَلَيْنَا صَبْرًا وَتَوَفَّنَا مُسْلِمِينَ ﴿١٢٦﴾ وَقَالَ ٱلْمَلَأُ مِن قَوْمِ فِرْعَوْنَ أَتَذَرُ مُوسَىٰ وَقَوْمَهُۥ لِيُفْسِدُوا۟ فِى ٱلْأَرْضِ وَيَذَرَكَ وَءَالِهَتَكَ ۚ قَالَ سَنُقَتِّلُ أَبْنَآءَهُمْ وَنَسْتَحْىِۦ نِسَآءَهُمْ وَإِنَّا فَوْقَهُمْ قَٰهِرُونَ ﴿١٢٧﴾ قَالَ مُوسَىٰ لِقَوْمِهِ ٱسْتَعِينُوا۟ بِٱللَّهِ وَٱصْبِرُوٓا۟ ۖ إِنَّ ٱلْأَرْضَ لِلَّهِ يُورِثُهَا مَن يَشَآءُ مِنْ عِبَادِهِۦ ۖ وَٱلْعَٰقِبَةُ لِلْمُتَّقِينَ ﴿١٢٨﴾ قَالُوٓا۟ أُوذِينَا مِن قَبْلِ أَن تَأْتِيَنَا وَمِنۢ بَعْدِ مَا جِئْتَنَا ۚ قَالَ عَسَىٰ رَبُّكُمْ أَن يُهْلِكَ عَدُوَّكُمْ وَيَسْتَخْلِفَكُمْ فِى ٱلْأَرْضِ فَيَنظُرَ كَيْفَ تَعْمَلُونَ ﴿١٢٩﴾ وَلَقَدْ أَخَذْنَآ ءَالَ فِرْعَوْنَ بِٱلسِّنِينَ وَنَقْصٍ مِّنَ ٱلثَّمَرَٰتِ لَعَلَّهُمْ يَذَّكَّرُونَ ﴿١٣٠﴾

(١٢١) جادووگەران وتیان: ئێمە باوەڕێکی پتەومان هێناوە بە پەروەردگاری جیهانیان...

(١٢٢) کە پەروەردگاری موسا و هاروونە.

(١٢٣) فیرعەون وتی: ئایا باوەڕتان هێنا بە پەروەردگاری موسا و هاروون، پێش ئەوەی من مۆڵەت و رووخسەتتان بدەم؟! بەڕاستی دیارە کە ئەمە پیلانێکە سازتانداوە و گێراوتانە لە شارەکەدا تا خەڵکەکەی لێ دەربەدەر بکەن، جا لەمەولا دەزانن (چیتان بەسەر دەهێنم)...

(١٢٤) سوێند بێت دەست و قاچتان راست و چەپ دەبڕم، پاشان سوێند بێت هەمووتان هەڵدەواسم و لە خاچتان دەدەم.

(١٢٥) (جادووگەرانی ئەوسا کە ئیماندارانی ئێستەن) وتیان: (ئێمە باکمان نیە) بەڕاستی ئێمە هەر بۆ لای پەروەردگارمان دەگەڕێینەوە...

(١٢٦) تۆ هیچ بێزاریەکت لە ئێمە نیە جگە لەوە کە باوەڕمان بەبەڵگە و موعجیزەکانی پەروەردگارمان هێناوە، کاتێک بۆمان هات، (پاشان دەستی نزاو پارانەوەیان بەرز کردەوە و وتیان) پەروەردگارا خۆگری و ئارامیمان بەسەردا بڕێژەو بە موسڵمانێتی بمانمرێنە.

(١٢٧) هەندێک لە دەسەڵاتدارانی دارو دەستەی فیرعەون وتیان: ئایا (هەروا بەئاسانی) واز لە موساو قەومەکەی دەهێنیت بۆ ئەوەی خراپە و تاوان بچێنن لەم زەویەداو واز لە خۆت و خواکانت بهێنن؟! فیرعەون وتی: (چۆن وازیان لێ دەهێنین) لەمەودوا بەزۆریی کوڕەکانیان دەکوژین، ئافرەتانیشیان بەزیندوویی دەهێڵینەوە (بۆ کەنیزەکی) و بەڕاستی ئێمە بەسەریاندا زاڵین و چاوپۆشیان لێناکەین.

(١٢٨) موسا بەقەومەکەی وت: داوای کۆمەکی و پشتیوانی لە خوا بکەن و دان بەخۆدا بگرن و ئارامگر بن، بەڕاستی زەوی موڵکی خوایەو دەیسپێرێت بەهەرکەس کە بیەوێت لە بەندەکانی، سەرئەنجامیش هەر بۆ پارێزکارانە.

(١٢٩) (قەومەکەی موسا دیارە زۆر لە ناخۆشیدا بوون) بۆیە وتیان: پێش ئەوەی تۆ بێیتە ناومان و دوای ئەوەش کە هاتوویت (بارودۆخی ئێمە نەگۆڕاوە) هەر ئازاردراو بووین، موسا وتی: ئومێد وایە پەروەردگارتان دوژمنەکەتان لەناو ببات و بتانکاتە جێنشین لە زەویدا، ئەوسا سەیرتان دەکات کە ئێوە چۆن کاردەکەن!!

(١٣٠) سوێند بێت بەخوا بەڕاستی ئێمە شوێنکەوتوەکان و گەلی فیرعەونمان گیرۆدەی چەند ساڵێکی گرانی و نەهاتی و کەم بونەوەی رزق و رۆزیی و بەروبوومەکان کرد، بۆ ئەوەی ئەوان دابچڵەکێن و پەند وەرگرن و بیربکەنەوە.

فَإِذَا جَآءَتۡهُمُ ٱلۡحَسَنَةُ قَالُواْ لَنَا هَٰذِهِۦۖ وَإِن تُصِبۡهُمۡ سَيِّئَةٞ يَطَّيَّرُواْ بِمُوسَىٰ وَمَن مَّعَهُۥٓۗ أَلَآ إِنَّمَا طَٰٓئِرُهُمۡ عِندَ ٱللَّهِ وَلَٰكِنَّ أَكۡثَرَهُمۡ لَا يَعۡلَمُونَ ﴿١٣١﴾ وَقَالُواْ مَهۡمَا تَأۡتِنَا بِهِۦ مِنۡ ءَايَةٖ لِّتَسۡحَرَنَا بِهَا فَمَا نَحۡنُ لَكَ بِمُؤۡمِنِينَ ﴿١٣٢﴾ فَأَرۡسَلۡنَا عَلَيۡهِمُ ٱلطُّوفَانَ وَٱلۡجَرَادَ وَٱلۡقُمَّلَ وَٱلضَّفَادِعَ وَٱلدَّمَ ءَايَٰتٖ مُّفَصَّلَٰتٖ فَٱسۡتَكۡبَرُواْ وَكَانُواْ قَوۡمٗا مُّجۡرِمِينَ ﴿١٣٣﴾ وَلَمَّا وَقَعَ عَلَيۡهِمُ ٱلرِّجۡزُ قَالُواْ يَٰمُوسَى ٱدۡعُ لَنَا رَبَّكَ بِمَا عَهِدَ عِندَكَۖ لَئِن كَشَفۡتَ عَنَّا ٱلرِّجۡزَ لَنُؤۡمِنَنَّ لَكَ وَلَنُرۡسِلَنَّ مَعَكَ بَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ ﴿١٣٤﴾ فَلَمَّا كَشَفۡنَا عَنۡهُمُ ٱلرِّجۡزَ إِلَىٰٓ أَجَلٍ هُم بَٰلِغُوهُ إِذَا هُمۡ يَنكُثُونَ ﴿١٣٥﴾ فَٱنتَقَمۡنَا مِنۡهُمۡ فَأَغۡرَقۡنَٰهُمۡ فِي ٱلۡيَمِّ بِأَنَّهُمۡ كَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِنَا وَكَانُواْ عَنۡهَا غَٰفِلِينَ ﴿١٣٦﴾ وَأَوۡرَثۡنَا ٱلۡقَوۡمَ ٱلَّذِينَ كَانُواْ يُسۡتَضۡعَفُونَ مَشَٰرِقَ ٱلۡأَرۡضِ وَمَغَٰرِبَهَا ٱلَّتِي بَٰرَكۡنَا فِيهَاۖ وَتَمَّتۡ كَلِمَتُ رَبِّكَ ٱلۡحُسۡنَىٰ عَلَىٰ بَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ بِمَا صَبَرُواْۖ وَدَمَّرۡنَا مَا كَانَ يَصۡنَعُ فِرۡعَوۡنُ وَقَوۡمُهُۥ وَمَا كَانُواْ يَعۡرِشُونَ ﴿١٣٧﴾

(١٣١) جا ئەوانە کاتێک خێرو چاکەیەکیان بۆ بێت ئەوە دەڵێن: ئەمە حەقی خۆمانە و ئێمە شایستەین، خۆ ئەگەر ناخۆشیەکیان تووش بێت تۆباڵ و شوومیان دەدەنە پاڵ موساو ئەوانەی لەگەڵیدا بوون، ئاگاداربن بەڕاستی هەرچی رەشبینی و گەشبینیان هەیە هەمووی لەلایەن خواوەیە، بەڵام زۆربەیان ئەم راستیانە تێ ناگەن و نایزانن.

(١٣٢) (فیرعەون و دارو دەستەی) وتیان: هەر چیمان بۆ بهێنێت لە بەڵگەو موعجیزە تا چاوبەستمان لێبکەی پێی، ئەوە ئێمە هەر بڕوادارنین بە تۆ!!

(١٣٣) جا ئێمەش بەڵای لافاوو کوللە و ئەسپێ و بۆقی جۆراو جۆرو خوێنمان ناردە سەریان لە کاتێکدا ئەوانە چەندەها بەڵگەی روون بوون (لەسەر تاوانباریان)، کەچی ئەوان هەر لووت بەرزیان کردو خۆیان بەزل و گەورەزانی، بەڕاستی قەومێکی تاوانبارو تاوانکار بوون.

(١٣٤) جا کاتێکیش هەر بەڵایەک لەو بەڵایانە بەسەریاندا هات (پەنایان دەبرد بۆ موسا) و دەیانوت: ئەی موسا (فریامان بکەوە) لە پەروەردگارت بپاڕێرەوە بۆمان، بەو پەیمانەی کە خوا لای داناویت، سوێند بەخوا ئەگەر ئەم بەڵایانەمان لەسەر هەڵگری ئەوسا بێگومان باوەڕت پێدەکەین و نەوەی ئیسرائیلیش ئازاد دەکەین و لەگەڵتا دەنێرین.

(١٣٥) جاکاتێک بەڵاکانمان لەسەر لادەبردن بۆ کاتێکی دیاریکراو کە ئەوان پێی دەگەیشتن، ئەوە خێرا پەیمانەکانیان دەشکاندو لە سنوور دەترازان و(دەچوونەوە دۆخی جاران).

(١٣٦) جا ئێمەش تۆڵەمان لێسەندن و نوقمی دەریامان کردن، چونکە ئەوان بڕوایان بە بەڵگە و موعجیزەکانی ئێمە نەبوو بە درۆیان دادەنا و، ئەوان لێی بێئاگا بوون.

(١٣٧) ئەوسا ئەو قەوم و گەلەی لاواز دەکران و دەچەوسێنرانەوە لە هەموو خۆرهەڵات و خۆرئاوای ئەو وڵاتەی کە فەڕو بەرەکەتمان بەسەردا رژاند بوو کردە جێنشین و بەڵێنی راست و جوانی پەروەردگارت (ئەی محمدﷺ) جێبەجێ بوو بۆ نەوەی ئیسرائیل بەهۆی ئەوەی کە ئارامیان لەسەرگرت، (کەواتە ئەگەر ئوممەتی تۆیش ئاوا خۆگرین بێگومان هەمان ئەنجام بەدەست دەهێنن)، هەرچیش فیرعەون و قەومەکەی دروستیان دەکردو ئەو کۆشک و تەلارسازیەی کە دەیانکرد، هەر هەموویمان کاول و وێران کرد.

وَجَٰوَزۡنَا بِبَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ ٱلۡبَحۡرَ فَأَتَوۡاْ عَلَىٰ قَوۡمٖ يَعۡكُفُونَ عَلَىٰٓ أَصۡنَامٖ لَّهُمۡۚ قَالُواْ يَٰمُوسَى ٱجۡعَل لَّنَآ إِلَٰهٗا كَمَا لَهُمۡ ءَالِهَةٞۚ قَالَ إِنَّكُمۡ قَوۡمٞ تَجۡهَلُونَ ﴿١٣٨﴾ إِنَّ هَٰٓؤُلَآءِ مُتَبَّرٞ مَّا هُمۡ فِيهِ وَبَٰطِلٞ مَّا كَانُواْ يَعۡمَلُونَ ﴿١٣٩﴾ قَالَ أَغَيۡرَ ٱللَّهِ أَبۡغِيكُمۡ إِلَٰهٗا وَهُوَ فَضَّلَكُمۡ عَلَى ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴿١٤٠﴾ وَإِذۡ أَنجَيۡنَٰكُم مِّنۡ ءَالِ فِرۡعَوۡنَ يَسُومُونَكُمۡ سُوٓءَ ٱلۡعَذَابِ يُقَتِّلُونَ أَبۡنَآءَكُمۡ وَيَسۡتَحۡيُونَ نِسَآءَكُمۡۚ وَفِي ذَٰلِكُم بَلَآءٞ مِّن رَّبِّكُمۡ عَظِيمٞ ﴿١٤١﴾ ۞ وَوَٰعَدۡنَا مُوسَىٰ ثَلَٰثِينَ لَيۡلَةٗ وَأَتۡمَمۡنَٰهَا بِعَشۡرٖ فَتَمَّ مِيقَٰتُ رَبِّهِۦٓ أَرۡبَعِينَ لَيۡلَةٗۚ وَقَالَ مُوسَىٰ لِأَخِيهِ هَٰرُونَ ٱخۡلُفۡنِي فِي قَوۡمِي وَأَصۡلِحۡ وَلَا تَتَّبِعۡ سَبِيلَ ٱلۡمُفۡسِدِينَ ﴿١٤٢﴾ وَلَمَّا جَآءَ مُوسَىٰ لِمِيقَٰتِنَا وَكَلَّمَهُۥ رَبُّهُۥ قَالَ رَبِّ أَرِنِيٓ أَنظُرۡ إِلَيۡكَۚ قَالَ لَن تَرَىٰنِي وَلَٰكِنِ ٱنظُرۡ إِلَى ٱلۡجَبَلِ فَإِنِ ٱسۡتَقَرَّ مَكَانَهُۥ فَسَوۡفَ تَرَىٰنِيۚ فَلَمَّا تَجَلَّىٰ رَبُّهُۥ لِلۡجَبَلِ جَعَلَهُۥ دَكّٗا وَخَرَّ مُوسَىٰ صَعِقٗاۚ فَلَمَّآ أَفَاقَ قَالَ سُبۡحَٰنَكَ تُبۡتُ إِلَيۡكَ وَأَنَا۠ أَوَّلُ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ ﴿١٤٣﴾



(١٣٨) لەوەودوا ئەوەی ئیسرائیلمان لە دەریاکە پەڕاندەوە، دوای تاوێک ڕێیان کەوت لە خەڵکێک کە بەدەوری بتەکانیاندا دەخولانەوەو دەیانپەرستن ، (دەستەیەکیان) وتیان: ئەی موسا خوایەکیش بۆ ئێمە ساز بکە وەکو ئەوانە ئەوەتە چەند خوایەکیان هەیە!! موسا پێی وتن: بەڕاستی ئێوە قەومێکن نەدەزانن و نەدەفامن...

(١٣٩) بێگومان ئائەوانە ئەوەی تێیدا دەژین لەناوچووە و، پووچەڵە ئەوەی ئەوان دەیانکرد.

(١٤٠) موسا وتی: ئایا کەی ڕەوایە بێجگە لە خوا خوایەکی ترتان بۆ بخوازم، لەکاتێکدا کە ئەو زاتە لەناو خەڵکی ئەم جیهانەدا هەڵی بژاردوون و ڕێزی زیاتری لێناوون.

(١٤١) یادی ئەو کاتەش بکەن کە ڕزگارمان کردن لە دارو دەستەی فیرعەون کاتێک کە ناسۆرترین ئەشکەنجەیان دەدان، بەشێوەیەکی دڕندانە زۆرینەی کورەکانی ئێوەیان دەکوشت وئافرەتەکانی ئێوەشیان دەهێشتەوە (بۆ کەنیزەکی)، لەوەشدا بەڵاو تاقیکردنەوەیەکی گەورە هەیە بۆتان لەلایەن پەروەردگارتانەوە (بۆچی زوو فەرامۆشتان کرد).

(١٤٢) بەڵێنی سی شەومان بە موسادا (کە خواپەرستی تێدا بکات، تا ئامادە بێت بۆ وەرگرتنی تەورات) و بە دە شەوی تر ماوەکەمان تەواوکرد، ئینجا کاتی گفتوگۆی موسا لەگەڵ پەروەردگاریدا تەواو بوو کە گەیشتە چل شەو، موسا (پێش ڕۆیشتنی بۆ کێوی طور) بە هاروونی برای وت: ئیتر تۆ لە جیاتی من بە لەناو قەوم و عەشرەتمدا دەوری چاکسازی ببینە و نەکەیت شوێن ڕێبازی ئەوانە بکەویت کە چێنەری تۆوی خراپەن.

(١٤٣) جا کاتێک موسا هات بۆ کات و شوێنی دیاریکراومان و پەروەردگاریشی گفتوگۆی ڕاستەوخۆی لەگەڵدا ئەنجامدا (دیارە لە حاڵەتێکی ڕۆحی و دەروونی زۆر بەرزدا بووە، کەوتۆتە جیهانێکی زۆر سەیرو خۆشەوە کە قەڵەم ناتوانێت باسی بکات و زمان ناتوانێت وەسفی بکات، ئاخر ئاخەقی نیە، پەروەردگاری، ئەم بوونەوەرە گفتوگۆ لەگەڵ بەندەیەکی خۆیدا ئەنجام بدات، با پێغەمبەریش بێت، بۆیە لە خۆشیدا هاتە گفت و) وتی: (تو خوا، خوایە گیان، ئەی پەروەردگاری ئازیزم) خۆتم نیشان بدە تا تێر تەماشات بکەم، خوای گەورەش فەرمووی: هەرگیز (لە دنیادا) نامبینیت (بۆ دڵنیاکردنی لەوەی کە بەرگەی تەجەلای زاتی پەروەردگار ناگرێت) پێی فەرموو: بەڵام (ئەگەر هەر حەز دەکەیت) سەیری ئەو چیایە بکە، جا ئەگەر مایەوە لە جێگەی خۆیدا ئەوا لەوەودوا تۆش من دەبینیت، جا کاتێک پەروەردگاری خۆی نیشانی کێوەکەداو تەجەلای کرد، کێوەکەی سڵوتاند و ورد و خاشی کرد، موساش کەوت و لە هۆش خۆی چوو، ئینجا کاتێک هاتەوە هۆش خۆی (زانی داخوازیەکەی زۆر گەورە بووە) وتی: ستایش و بێگەردی و کەماڵ هەر شایستەی تۆیە، من پەشیمانم لە داخوازیەکەم و گەڕامەوە بۆ لای تۆ و من یەکەم کەسم لە ئیمانداران.

قَالَ يَـٰمُوسَىٰٓ إِنِّى ٱصْطَفَيْتُكَ عَلَى ٱلنَّاسِ بِرِسَـٰلَـٰتِى وَبِكَلَـٰمِى فَخُذْ مَآ ءَاتَيْتُكَ وَكُن مِّنَ ٱلشَّـٰكِرِينَ ﴿١٤٤﴾ وَكَتَبْنَا لَهُۥ فِى ٱلْأَلْوَاحِ مِن كُلِّ شَىْءٍ مَّوْعِظَةً وَتَفْصِيلًا لِّكُلِّ شَىْءٍ فَخُذْهَا بِقُوَّةٍ وَأْمُرْ قَوْمَكَ يَأْخُذُوا۟ بِأَحْسَنِهَا ۚ سَأُو۟رِيكُمْ دَارَ ٱلْفَـٰسِقِينَ ﴿١٤٥﴾ سَأَصْرِفُ عَنْ ءَايَـٰتِىَ ٱلَّذِينَ يَتَكَبَّرُونَ فِى ٱلْأَرْضِ بِغَيْرِ ٱلْحَقِّ وَإِن يَرَوْا۟ كُلَّ ءَايَةٍ لَّا يُؤْمِنُوا۟ بِهَا وَإِن يَرَوْا۟ سَبِيلَ ٱلرُّشْدِ لَا يَتَّخِذُوهُ سَبِيلًا وَإِن يَرَوْا۟ سَبِيلَ ٱلْغَىِّ يَتَّخِذُوهُ سَبِيلًا ۚ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ كَذَّبُوا۟ بِـَٔايَـٰتِنَا وَكَانُوا۟ عَنْهَا غَـٰفِلِينَ ﴿١٤٦﴾ وَٱلَّذِينَ كَذَّبُوا۟ بِـَٔايَـٰتِنَا وَلِقَآءِ ٱلْـَٔاخِرَةِ حَبِطَتْ أَعْمَـٰلُهُمْ ۚ هَلْ يُجْزَوْنَ إِلَّا مَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴿١٤٧﴾ وَٱتَّخَذَ قَوْمُ مُوسَىٰ مِنۢ بَعْدِهِۦ مِنْ حُلِيِّهِمْ عِجْلًا جَسَدًا لَّهُۥ خُوَارٌ ۚ أَلَمْ يَرَوْا۟ أَنَّهُۥ لَا يُكَلِّمُهُمْ وَلَا يَهْدِيهِمْ سَبِيلًا ۘ ٱتَّخَذُوهُ وَكَانُوا۟ ظَـٰلِمِينَ ﴿١٤٨﴾ وَلَمَّا سُقِطَ فِىٓ أَيْدِيهِمْ وَرَأَوْا۟ أَنَّهُمْ قَدْ ضَلُّوا۟ قَالُوا۟ لَئِن لَّمْ يَرْحَمْنَا رَبُّنَا وَيَغْفِرْ لَنَا لَنَكُونَنَّ مِنَ ٱلْخَـٰسِرِينَ ﴿١٤٩﴾

(١٤٤) (خوای گەورە) فەرمووی: ئەی موسا بەڕاستی من تۆم هەڵبژاردوە لەناو خەڵکیدا بەهۆی پەیامەکانمەوە و گفتوگۆکردنیشم لەگەڵ تۆدا، جا هەرچیەکم پێبەخشیوویت بە تونـدو تۆڵی بیگرەو پەیڕەوی بکەو ڕای بگەیەنە و هەمیشە و بەردەوام لە سوپاسگوزاران بە.

(١٤٥) لە تابلۆکانی (تەوراتیشدا) لە هەموو بابەتێکمان بۆ تۆمار کردبوو، ئامۆژگاری تێرو تەواو (بۆ هەموو چالاکیەکانی ژیان)، هەروەها روون کردنەوە بۆ هەموو شتێک و هەموو بابەتێک، کەوابوو ئەی موسا: بەتوندی بیانگرە و پەیڕەویان بکەو فەرمان بە قەومەکەشت بدە: کە بەجوانترین شێوە وەریان بگرن و پەیڕەویان بکەن، لە ئایندەدا خانووبەرە و شوێنی تاوانبارو لە سنوور دەرچوانتان نیشان دەدەم (چۆن وێرانی دەکەین).

(١٤٦) ئەو کەسانەی کە بەناحەق فیز دەکەن لە زەویداو خۆیان بەگەورەتر دەنوێنن (لە خەڵکی)، لەمەودوا رووی دڵیان وەردەچەرخێنم لە تێگەیشتنی ئایەت و فەرمانەکانم، خۆ ئەوانە ئەگەر هەر بەڵگە و نیشانەیەک ببینن ئەوە باوەڕی پێناکەن، ئەگەر ڕێبازی بەرژەوەندی دنیاو قیامەت ببینن ئەوە نایگرنەبەر، خۆ ئەگەر ڕێبازی ئارەزوو پەرستی و گومڕایی ببینن، ئەوە دەیگرنە بەرو پەیڕەوی دەکەن، ئەوە لەبەر ئەوەیە چونکە بەڕاستی ئەوان بڕوایان بەئایەت و فەرمانەکانی ئێمە نەبوو لێیان بێئاگا بوون.

(١٤٧) جا ئەوانەی کە ئایەت و فەرمانەکانی ئێمە و بە یەکگەیشتنەوەیان لە دوارۆژدا بەدرۆزانی، ئەوانە هەموو کاروکردەوەکانیان پووچ و بێ نرخ و بێ سوود بوو، ئایا پاداشتی هیچ شتێکیان دەدرێتەوە جگە لەوەی کە دەیانکرد؟!

(١٤٨) جا لە دوای چوونی موسا (بۆ کێوی طور) قەومەکەی پەیکەری گوێرەکەیەکیان لە خشڵەکانیان دروست کرد، کە بۆڕەیەکی هەبوو!! ئایا ئەوان نەیانزانی کە ئەوە بەڕاستی قسەیان لەگەڵدا ناکات و ڕێنموویان ناکات بۆ هیچ ڕێیەک، (سەیرە لەگەڵ ئەو هەموو کەم و کوڕیانەشدا) کردیان بەخوای خۆیان، ئەوانە ستەمکار بوون.

(١٤٩) کاتێکیش کە لە دەستیان چوو و پەشیمان بوونەوە و (ڕاستییان بۆ دەرکەوت و گوێرەکە بوو بە پەند لەبەر چاویان) زانیان و دڵنیا بوون کە بەڕاستی گومڕا بوون و وتیان: سوێند بە خوا ئەگەر پەروەردگارمان بەزەیی پیاماندا نەیەتەوە و لێمان خۆش نەبێت، ئەوە بەڕاستی لە زەرەرمەندانین.

وَلَمَّا رَجَعَ مُوسَىٰٓ إِلَىٰ قَوۡمِهِۦ غَضۡبَٰنَ أَسِفٗا قَالَ بِئۡسَمَا خَلَفۡتُمُونِي مِنۢ بَعۡدِيٓۖ أَعَجِلۡتُمۡ أَمۡرَ رَبِّكُمۡۖ وَأَلۡقَى ٱلۡأَلۡوَاحَ وَأَخَذَ بِرَأۡسِ أَخِيهِ يَجُرُّهُۥٓ إِلَيۡهِۚ قَالَ ٱبۡنَ أُمَّ إِنَّ ٱلۡقَوۡمَ ٱسۡتَضۡعَفُونِي وَكَادُواْ يَقۡتُلُونَنِي فَلَا تُشۡمِتۡ بِيَ ٱلۡأَعۡدَآءَ وَلَا تَجۡعَلۡنِي مَعَ ٱلۡقَوۡمِ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿١٥٠﴾ قَالَ رَبِّ ٱغۡفِرۡ لِي وَلِأَخِي وَأَدۡخِلۡنَا فِي رَحۡمَتِكَۖ وَأَنتَ أَرۡحَمُ ٱلرَّٰحِمِينَ ﴿١٥١﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ ٱتَّخَذُواْ ٱلۡعِجۡلَ سَيَنَالُهُمۡ غَضَبٞ مِّن رَّبِّهِمۡ وَذِلَّةٞ فِي ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَاۚ وَكَذَٰلِكَ نَجۡزِي ٱلۡمُفۡتَرِينَ ﴿١٥٢﴾ وَٱلَّذِينَ عَمِلُواْ ٱلسَّيِّـَٔاتِ ثُمَّ تَابُواْ مِنۢ بَعۡدِهَا وَءَامَنُوٓاْ إِنَّ رَبَّكَ مِنۢ بَعۡدِهَا لَغَفُورٞ رَّحِيمٞ ﴿١٥٣﴾ وَلَمَّا سَكَتَ عَن مُّوسَى ٱلۡغَضَبُ أَخَذَ ٱلۡأَلۡوَاحَۖ وَفِي نُسۡخَتِهَا هُدٗى وَرَحۡمَةٞ لِّلَّذِينَ هُمۡ لِرَبِّهِمۡ يَرۡهَبُونَ ﴿١٥٤﴾ وَٱخۡتَارَ مُوسَىٰ قَوۡمَهُۥ سَبۡعِينَ رَجُلٗا لِّمِيقَٰتِنَاۖ فَلَمَّآ أَخَذَتۡهُمُ ٱلرَّجۡفَةُ قَالَ رَبِّ لَوۡ شِئۡتَ أَهۡلَكۡتَهُم مِّن قَبۡلُ وَإِيَّٰيَۖ أَتُهۡلِكُنَا بِمَا فَعَلَ ٱلسُّفَهَآءُ مِنَّآۖ إِنۡ هِيَ إِلَّا فِتۡنَتُكَ تُضِلُّ بِهَا مَن تَشَآءُ وَتَهۡدِي مَن تَشَآءُۖ أَنتَ وَلِيُّنَا فَٱغۡفِرۡ لَنَا وَٱرۡحَمۡنَاۖ وَأَنتَ خَيۡرُ ٱلۡغَٰفِرِينَ ﴿١٥٥﴾

(١٥٠) جا کاتێک موسا گەڕایەوە بۆ لای قەومەکەی (زانی بووی خەریکی گوێرەکە پەرستین) زۆر بەتوڕەیی و پەستی و غەمباریەوە وتی: بەراستی دوای ڕۆشتنی من جێنشینیەکی خراپی منتان کرد، ئەوە پەلەتان کرد لە وادەی پەروەردگارتاندا؟ (ئیتر لەداخی ئەو لادان و سەرگەردانیە) تابلۆکانی (تەورات)ی فڕێداو پەلاماری قژی (هاروون)ی برای داو رای کێشا بۆ لای خۆی، (هاروون) وتی: کوڕی دایکم (خەتای من نەبوو، من زۆر هەوڵمدا بەڵام بێ سوود بوو) بە ڕاستی ئەو خەڵکە زۆریان بۆ هێنام و هێزیان لێسەندم، خەریک بوو بشمکوژن (کاکە گیان) کەوابوو دوژمنانم پێ شاد مەکە و لەگەڵ قەومی ستەمکاردا حسابم بۆ مەکە.

(١٥١) (ئەوسا ئیتر موسا بەخۆیدا هاتەوە و) وتی: پەروەردگارا لە خۆم و براکەشم خۆش ببە و هەردووکمان بخەرە نێو ڕەحمەت و میهرەبانی خۆتەوە و تۆ لە هەموو کەس بەسۆزتر و میهرەبانتریت.

(١٥٢) بەڕاستی ئەوانەی کە گوێرەکەکەیان پەرست، لەئایندەدا لەلایەن پەروەردگاریانەوە خەشم و قینیان دەگاتێ و زەلیلی و خەجاڵەتییش بەشیان دەبێت لە ژیانی دنیادا، هەر بەو شێوەیەش پاداشتی ئەوانە دەدەینەوە کە درۆ بەدەم خواوە هەڵدەبەستن.

(١٥٣) ئەوانەش کە کردارە خراپەکانیان ئەنجامداوە و پاشان لە دوای کردارە خراپەکان تەوبەیان کردو پەشیمان بوونەوە و باوەڕێکی دامەزراویان هێنا، ئەوە بێگومان پەروەردگاری تۆ (ئەی محمد ﷺ) لە دوای ئەنجامدانی ئەوکارانە لێخۆشبوو میهرەبانە.

(١٥٤) کاتێک تووڕەیی موسا هێور بۆوە، تابلۆکانی (تەورات)ی هەڵگرتەوە، کەلە توێیدا ڕێنموویی و ڕەحمەت و میهرەبانی تیادا دەدرەوشایەوە بۆ ئەوانەی کە لە پەروەردگاریان دەترسن و مەبەستیانە لێیان نەرەنجێت.

(١٥٥) (دوای ماوەیەک) موسا حەفتا پیاوی لە قەومەکەی هەڵبژارد (تا پەشیمانی تەواو دەربڕن لەگوێرەکە پەرستی، لەکاتی دیاری کراودا بردنی بۆ لای کێوی طور) جا کاتێک تووشی بوومەلەرزەکە بوون و گرتنی، موسا وتی: پەروەردگارا خۆ ئەگەر بتویستایە پێشتر منیش و ئەوانیشت لەناو دەبرد، ئایا ئێمە لەناو دەبەیت بەهۆی ئەوەی کە ئەو نەفامانەمان کردویانە، ئەمە هیچ شتێک نیە تەنها تاقیکردنەوەیەکی زاتی تۆ نەبێت کە ئەوەی بتەوێت پێگومڕا دەکەیت، ئەوەش بتەوێت هیدایەتی دەدەیت، هەر تۆ پشت و پەنای ئێمەی، جا (داواکارین) لێمان خۆش ببیت و بەزەییت پیاماندا بێتەوە، تۆ چاکترینی چاوپۆشیکەرانی.



وَٱكۡتُبۡ لَنَا فِي هَٰذِهِ ٱلدُّنۡيَا حَسَنَةٗ وَفِي ٱلۡأٓخِرَةِ إِنَّا هُدۡنَآ إِلَيۡكَۚ قَالَ عَذَابِيٓ أُصِيبُ بِهِۦ مَنۡ أَشَآءُۖ وَرَحۡمَتِي وَسِعَتۡ كُلَّ شَيۡءٖۚ فَسَأَكۡتُبُهَا لِلَّذِينَ يَتَّقُونَ وَيُؤۡتُونَ ٱلزَّكَوٰةَ وَٱلَّذِينَ هُم بِـَٔايَٰتِنَا يُؤۡمِنُونَ ﴿١٥٦﴾ ٱلَّذِينَ يَتَّبِعُونَ ٱلرَّسُولَ ٱلنَّبِيَّ ٱلۡأُمِّيَّ ٱلَّذِي يَجِدُونَهُۥ مَكۡتُوبًا عِندَهُمۡ فِي ٱلتَّوۡرَىٰةِ وَٱلۡإِنجِيلِ يَأۡمُرُهُم بِٱلۡمَعۡرُوفِ وَيَنۡهَىٰهُمۡ عَنِ ٱلۡمُنكَرِ وَيُحِلُّ لَهُمُ ٱلطَّيِّبَٰتِ وَيُحَرِّمُ عَلَيۡهِمُ ٱلۡخَبَٰٓئِثَ وَيَضَعُ عَنۡهُمۡ إِصۡرَهُمۡ وَٱلۡأَغۡلَٰلَ ٱلَّتِي كَانَتۡ عَلَيۡهِمۡۚ فَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ بِهِۦ وَعَزَّرُوهُ وَنَصَرُوهُ وَٱتَّبَعُواْ ٱلنُّورَ ٱلَّذِيٓ أُنزِلَ مَعَهُۥٓ أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡمُفۡلِحُونَ ﴿١٥٧﴾ قُلۡ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِنِّي رَسُولُ ٱللَّهِ إِلَيۡكُمۡ جَمِيعًا ٱلَّذِي لَهُۥ مُلۡكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۖ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ يُحۡيِۦ وَيُمِيتُۖ فَـَٔامِنُواْ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِ ٱلنَّبِيِّ ٱلۡأُمِّيِّ ٱلَّذِي يُؤۡمِنُ بِٱللَّهِ وَكَلِمَٰتِهِۦ وَٱتَّبِعُوهُ لَعَلَّكُمۡ تَهۡتَدُونَ ﴿١٥٨﴾ وَمِن قَوۡمِ مُوسَىٰٓ أُمَّةٞ يَهۡدُونَ بِٱلۡحَقِّ وَبِهِۦ يَعۡدِلُونَ ﴿١٥٩﴾

(١٥٦) داواکارین کە لە دنیادا چاکەمان بۆ پێش بهێنیت و لە قیامەتیشدا، ئێمە بەڕاستی ڕێنموویی کراوین بۆ لای زاتی تۆ، (خوای گەورە لە وەلامیاندا) فەرمووی: سزاو تۆڵەم تووشی کەسێک دەکەم کە بمەوێت و (شایستە بێت)، رەحمەت و میهرەبانیم هەموو شتێکی گرتۆتەوە، جا لەمەودوا ئەو رەحمەت و میهرەبانیەم تۆمار دەکەم و بڕیار دەدەم بۆ ئەو کەسانەی کە تەقواو پارێزکاری دەکەن و زەکات دەدەن و ئەوانەش کە باوەڕی تەواو بەئایەت و فەرمانەکانی ئێمە دەهێنن...

(١٥٧) ئەوانەی کە شوێنی ئەم (محمد ﷺ) پێغەمبەرە هەواڵدەرە نەخوێندەوارە دەکەون ئەوەی کە(گاورو جوو، ناوو نیشانیان) دەستیان دەکەوێت نووسراوە لای ئەوان لە تەورات و ئینجیلدا، فەرمانیان پێدەدات بەچاکەو قەدەغەی گوناهو خراپەیان لێدەکات و هەرچیەک پاکو چاکە بۆیان حەلاڵ دەکات و هەرچی پیس و ناپوختە لێیان حەرام دەکات و ئەرکە قورس و سەنگینەکان لەسەرشانیان لادەبات، ئەو کۆت و زنجیرانەش کە لەسەریان بوو لای دەبات (وەک خۆ کوشتن لەکاتی تەوبەدا.. هتد)، جا ئەوانەی باوەڕیان پێهێناوە و پشتیوانیان لێکردووە و پشتگیریان کردووە و شوێنی ئەو نوورە کەوتوون (کە قورئانە) و هاوڕێ لەگەڵیدا رەوانە کراوە، هەر ئەوانە سەرفرازو رزگارن.

(١٥٨) (ئەی محمد ﷺ) بڵێ: ئەی خەڵکینە بەڕاستی من پێغەمبەرو فرستادەی خوام بۆ ئێوە بەگشتی، ئەو خوایەی کە هەر بۆئەوە خاوەندارێتی ئاسمانەکان و زەویە، هیچ خوایەک نیە جگە لەو زاتە، دەژێنێت و دەمرێنێت، جا کەوابوو باوەڕی پتەو بهێنن بەو خوایەو بەپێغەمبەرەکەی، کە هەواڵدەرێکی نەخوێندەوارە، (تاهیچ کەس نەڵێت پیاوێکی خوێندەوار بووە و خۆی قورئانی داناوە) ئەو پێغەمبەرەی کە خۆی باوەڕ دەهێنێت بە خواو بە فەرموودەکانی، دە ئێوەش شوێنی بکەون، بۆ ئەوەی ئێوە ڕێنموویی وەرگرن.

(١٥٩) لە قەومی موسا کەسانێک هەن (ژیرو هۆشمەندن و شوێنی حەق دەکەون و) ڕێنموویی خەڵک دەکەن و شارەزایان دەکەن بەحەق و ڕاستی، هەر بەو حەقە خەڵکی ڕاست دەکەنەوە (لە لادان و سەرکەشی).

وَقَطَّعْنَٰهُمُ ٱثْنَتَىْ عَشْرَةَ أَسْبَاطًا أُمَمًا ۚ وَأَوْحَيْنَآ إِلَىٰ مُوسَىٰٓ إِذِ ٱسْتَسْقَىٰهُ قَوْمُهُۥٓ أَنِ ٱضْرِب بِّعَصَاكَ ٱلْحَجَرَ ۖ فَٱنۢبَجَسَتْ مِنْهُ ٱثْنَتَا عَشْرَةَ عَيْنًا ۖ قَدْ عَلِمَ كُلُّ أُنَاسٍ مَّشْرَبَهُمْ ۚ وَظَلَّلْنَا عَلَيْهِمُ ٱلْغَمَٰمَ وَأَنزَلْنَا عَلَيْهِمُ ٱلْمَنَّ وَٱلسَّلْوَىٰ ۖ كُلُوا۟ مِن طَيِّبَٰتِ مَا رَزَقْنَٰكُمْ ۚ وَمَا ظَلَمُونَا وَلَٰكِن كَانُوٓا۟ أَنفُسَهُمْ يَظْلِمُونَ ﴿١٦٠﴾ وَإِذْ قِيلَ لَهُمُ ٱسْكُنُوا۟ هَٰذِهِ ٱلْقَرْيَةَ وَكُلُوا۟ مِنْهَا حَيْثُ شِئْتُمْ وَقُولُوا۟ حِطَّةٌ وَٱدْخُلُوا۟ ٱلْبَابَ سُجَّدًا نَّغْفِرْ لَكُمْ خَطِيٓـَٰٔتِكُمْ ۚ سَنَزِيدُ ٱلْمُحْسِنِينَ ﴿١٦١﴾ فَبَدَّلَ ٱلَّذِينَ ظَلَمُوا۟ مِنْهُمْ قَوْلًا غَيْرَ ٱلَّذِى قِيلَ لَهُمْ فَأَرْسَلْنَا عَلَيْهِمْ رِجْزًا مِّنَ ٱلسَّمَآءِ بِمَا كَانُوا۟ يَظْلِمُونَ ﴿١٦٢﴾ وَسْـَٔلْهُمْ عَنِ ٱلْقَرْيَةِ ٱلَّتِى كَانَتْ حَاضِرَةَ ٱلْبَحْرِ إِذْ يَعْدُونَ فِى ٱلسَّبْتِ إِذْ تَأْتِيهِمْ حِيتَانُهُمْ يَوْمَ سَبْتِهِمْ شُرَّعًا وَيَوْمَ لَا يَسْبِتُونَ ۙ لَا تَأْتِيهِمْ ۚ كَذَٰلِكَ نَبْلُوهُم بِمَا كَانُوا۟ يَفْسُقُونَ ﴿١٦٣﴾

(١٦٠) ئێمە نەوەی ئیسرائیلمان کرد بە دوانزە تیرەو تایەفە (دوای ئەوەی بەبیابانی سینادا کۆچیان دەکرد تووشی تینویەتیەکی زۆر بوون)و وەحی و نیگامان بۆ موسا نارد کاتێک قەومەکەی داوای ئاویان لێکرد کە: بە دار عاساکەت بماڵە بەبەردەکەدا (هەر کە ئەو کارەی کرد) بەردەکە دوانزە کانی لێ هەڵقولا، بێگومان هەر تیرەو تایەفەیەک کانیاوی خۆی زانی و هەوریشمان کرد بە سێبەر بەسەریانەوە (تا گەرما زۆریان بۆ نەهێنێت)و گەزۆ و باڵندەی شەلاقەشمان بەسەردا باراندن، دە بخۆن لەو هەموو رزق و رۆزیە پاکانەی کە پێمان بەخشیوون، جا وەنەبێت ئەوانە ستەمیان لە ئێمە کردبێت (بە ناشوکری کردن و بێزاری دەربڕین) بەڵکو ستەمیان هەر لە خۆیان دەکرد.

(١٦١) یادی ئەو کاتە بکەرەوە کە پێیان وترا: لەم شارەدا کە(قودسە) نیشتەجێ ببن و لەو بەروبوومانەی کە بە دەوروو پشتیدا هەیە لە هەر شوێنێک ویستان بە ئارەزووی خۆتان لێی بخۆن و داوای لێخۆشبوون بکەن و بڵێن پەروەردگارا؛ لێمان خۆش ببە گوناهەکانمان لێ هەڵوەرێنە، جا لە دەروازەی شارەوە بە کڕنووشەوە بچنە ژوورەوە، ئەوە ئیتر ئێمە لە هەڵە و گوناهەکانتان خۆش دەبین، لەئایندەدا چاکەکاران پاداشتی زیاتریان دەدەینەوە (لە هەردوو جیهاندا).

(١٦٢) جا ئەوانەیان کە ستەمیان کردبوو فەرموودەکەیان گۆڕی بەشتێک ئەوە نەبوو کە پێیان وترا بوو، جائێمەش سزاو بەڵایەکمان لە ئاسمانەوە بەسەردا ناردن بەهۆی ئەو ستەمەوە کە دەیانکرد.

(١٦٣) پرسیار لە جووەکان بکە دەربارەی ئەو شارەی کە لەسەر قەراغی دەریا بوو، لەکاتێکدا ئەوان لە رۆژی شەممەدا سنووریان دەشکاند (کە بڕیار بوو رۆژی شەممە تەرخان بێت تەنها بۆ خواپەرستی) کاتێک لە رۆژی شەممەکەیاندا ماسیە گەورەکانیان بەسەر ئاوەوە بۆ دەهاتن، ئەو رۆژەش کە شەممەیان نەدەبوو ماسیەکانیان بۆ نە دەهات، ئا بەو شێوەیە بەهۆی یاخی بوون و لادانیانەوە تاقیمان کردنەوە.

وَإِذْ قَالَتْ أُمَّةٌ مِّنْهُمْ لِمَ تَعِظُونَ قَوْمًا اللَّهُ مُهْلِكُهُمْ أَوْ مُعَذِّبُهُمْ عَذَابًا شَدِيدًا قَالُوا مَعْذِرَةً إِلَىٰ رَبِّكُمْ وَلَعَلَّهُمْ يَتَّقُونَ ﴿١٦٤﴾ فَلَمَّا نَسُوا مَا ذُكِّرُوا بِهِ أَنجَيْنَا الَّذِينَ يَنْهَوْنَ عَنِ السُّوءِ وَأَخَذْنَا الَّذِينَ ظَلَمُوا بِعَذَابٍ بَئِيسٍ بِمَا كَانُوا يَفْسُقُونَ ﴿١٦٥﴾ فَلَمَّا عَتَوْا عَن مَّا نُهُوا عَنْهُ قُلْنَا لَهُمْ كُونُوا قِرَدَةً خَاسِئِينَ ﴿١٦٦﴾ وَإِذْ تَأَذَّنَ رَبُّكَ لَيَبْعَثَنَّ عَلَيْهِمْ إِلَىٰ يَوْمِ الْقِيَامَةِ مَن يَسُومُهُمْ سُوءَ الْعَذَابِ إِنَّ رَبَّكَ لَسَرِيعُ الْعِقَابِ وَإِنَّهُ لَغَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿١٦٧﴾ وَقَطَّعْنَاهُمْ فِي الْأَرْضِ أُمَمًا مِّنْهُمُ الصَّالِحُونَ وَمِنْهُمْ دُونَ ذَٰلِكَ وَبَلَوْنَاهُم بِالْحَسَنَاتِ وَالسَّيِّئَاتِ لَعَلَّهُمْ يَرْجِعُونَ ﴿١٦٨﴾ فَخَلَفَ مِن بَعْدِهِمْ خَلْفٌ وَرِثُوا الْكِتَابَ يَأْخُذُونَ عَرَضَ هَٰذَا الْأَدْنَىٰ وَيَقُولُونَ سَيُغْفَرُ لَنَا وَإِن يَأْتِهِمْ عَرَضٌ مِّثْلُهُ يَأْخُذُوهُ أَلَمْ يُؤْخَذْ عَلَيْهِم مِّيثَاقُ الْكِتَابِ أَن لَّا يَقُولُوا عَلَى اللَّهِ إِلَّا الْحَقَّ وَدَرَسُوا مَا فِيهِ وَالدَّارُ الْآخِرَةُ خَيْرٌ لِّلَّذِينَ يَتَّقُونَ أَفَلَا تَعْقِلُونَ ﴿١٦٩﴾ وَالَّذِينَ يُمَسِّكُونَ بِالْكِتَابِ وَأَقَامُوا الصَّلَاةَ إِنَّا لَا نُضِيعُ أَجْرَ الْمُصْلِحِينَ ﴿١٧٠﴾

(١٦٤) (دیـاره کـه هـەندێک لـەو جولەکانـە فەرمانی خوایان شکاندووە، بەهـەر فێڵێـک بـووە راوی خۆیـان کـردوە، بۆیـه دەستـەیەک لـە پیـاو چاکانیـان کەوتوونەتـە ئامۆژگـاری کردنـی دەست درێژکـاران) کـەچی کـاتێکیش دەستـەیەک لـەوان وتیان: بۆچـی ئامۆژگـاری کەسـانێک دەکـەن کـە خوا هەر لەناوبەریانە، یان سزادەریانە بەسزایەکی توند(لـە وەلامیـاندا) وتیـان: ئـاخر بابەڵگەیـەکی دڵسۆزی و غەمخۆری بێت بـۆ لای پـەروەردگارتان و بەو هیوایە ئەوان لە خوا بترسن.

(١٦٥) جا کـاتێک فەرامۆشـیان کـرد ئـەوەی ئامۆژگاریـان پێـی کرابـوو، ئێمـەش ئەوانـەی کـە قەدەغـەی خراپـەیان دەکـرد رزگارمـان کـردن و ئەوانەش کە ستەمیان کردو هـەوڵیاندا بـۆ کردنـی ئەوکارە ناڕەوایە، بەسزایەکی سـەخت گیرۆدەمـان کردن، بەهۆی ئەوەی لە سنوور دەرچوو بوون.

(١٦٦) جا کاتێک هەر سەرکەشیان کـرد لـەوەی کـە قەدەغـە کرابـوو لێیـان، ئێمـەش پێمـان وتـن: ببنە کۆمەڵە مـەیمونێکی سـووک و ریسـواو دوور لە رەحمی خوا.

(١٦٧) یـادی ئـەو کاتـەش بکـە پـەروەردگارت (ئـەی محمـد ﷺ) بریـاریدا و رایگـەیاند بـەڕاستی کەسـانێک دەنێرێتـە سـەریان تـا رۆژی قیامـەت، ئەشـکەنجەو ئـازاری سـەختیان بـدات، چونکـە بەڕاستی پـەروەردگارت زۆر بـەخێرایی تۆڵـە دەسـێنێت (لـە ستەمکاران)، هەروەها بێگومان لێخۆشبوو میهرەبانیشە (بۆ تەوبەکاران و ئیمانداران).

(١٦٨) سەرئەنجامیش ئەوەی ئیسرائیلمان کرد بەچەند بەشەوە لەسەر زەویدا، هەیانە چاک و لە خواترسـە، هەشـیانە وا نیە و لەپلەیەکی نزمدایەو بەچەندەها خۆشی و ناخۆشی تاقیمـان کـردنەوە بـۆ ئـەوەی ئـەوان بگـەڕێنەوە (بـۆ رێبـازی راست و دروست).

(١٦٩) جا لـە دوای ئـەوان نـەوەیەکـی نـوێ جـێگەی ئـەوانی گرتـەوە تـەوراتیان بـەمیراتی وەرگـرت، ئەوانـە (بـە پەرۆشەوە) پەلاماری کەلوپەلی (حەرامی) ئەم دنیایە دەدەن و دەشڵێن چاوپۆشیمان لێدەکرێت، خـۆ ئەگـەر کەلوپـەلێکی تریان بۆ بێت وەک ئەو، ئـەوە وەریدەگرن و دەیماشـنەوە (چاویـان تێرنـابێت)، باشـە، ئایـا ئەوانـە لەرێگـەی تەوراتـەوە پەیمانیان لێ وەرنەگیراوە کە بەناوی خواوە شتێک نەڵێن جگەلە حـەق و راستی؟ خۆ هەرچی لە تـەوراتدا هەیـە، ئەوانـە خوێندویانەو دەیزانن!!، بێگومان ماڵی قیامەت، بەهەشتی بەرین، چاکترە بۆ ئەوانـەی کـە خواناسـی و دینـداری دەکەنـە کالای بالایان، باشە ئەوە تاکەی ژیرنابن؟! (بۆ ئەوەندە دنیا پەرستن)؟!

(١٧٠) ئەوانەش کە بە تەوراتەوە پابەندی دەکەن (کە هانیان دەدات بۆ باوەڕهێنان بەمحمد ﷺ)و نوێژەکانیـان بـەچاکی ئەنجام دەدا، بێگومان ئێمە پاداشتی چاکسازان بەزایە نادەین.



۞ وَإِذْ نَتَقْنَا الْجَبَلَ فَوْقَهُمْ كَأَنَّهُ ظُلَّةٌ وَظَنُّوا أَنَّهُ وَاقِعٌ بِهِمْ خُذُوا مَا آتَيْنَاكُم بِقُوَّةٍ وَاذْكُرُوا مَا فِيهِ لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ ﴿١٧١﴾ وَإِذْ أَخَذَ رَبُّكَ مِن بَنِي آدَمَ مِن ظُهُورِهِمْ ذُرِّيَّتَهُمْ وَأَشْهَدَهُمْ عَلَىٰ أَنفُسِهِمْ أَلَسْتُ بِرَبِّكُمْ ۖ قَالُوا بَلَىٰ ۛ شَهِدْنَا ۛ أَن تَقُولُوا يَوْمَ الْقِيَامَةِ إِنَّا كُنَّا عَنْ هَٰذَا غَافِلِينَ ﴿١٧٢﴾ أَوْ تَقُولُوا إِنَّمَا أَشْرَكَ آبَاؤُنَا مِن قَبْلُ وَكُنَّا ذُرِّيَّةً مِّن بَعْدِهِمْ ۖ أَفَتُهْلِكُنَا بِمَا فَعَلَ الْمُبْطِلُونَ ﴿١٧٣﴾ وَكَذَٰلِكَ نُفَصِّلُ الْآيَاتِ وَلَعَلَّهُمْ يَرْجِعُونَ ﴿١٧٤﴾ وَاتْلُ عَلَيْهِمْ نَبَأَ الَّذِي آتَيْنَاهُ آيَاتِنَا فَانسَلَخَ مِنْهَا فَأَتْبَعَهُ الشَّيْطَانُ فَكَانَ مِنَ الْغَاوِينَ ﴿١٧٥﴾ وَلَوْ شِئْنَا لَرَفَعْنَاهُ بِهَا وَلَٰكِنَّهُ أَخْلَدَ إِلَى الْأَرْضِ وَاتَّبَعَ هَوَاهُ ۚ فَمَثَلُهُ كَمَثَلِ الْكَلْبِ إِن تَحْمِلْ عَلَيْهِ يَلْهَثْ أَوْ تَتْرُكْهُ يَلْهَث ۚ ذَّٰلِكَ مَثَلُ الْقَوْمِ الَّذِينَ كَذَّبُوا بِآيَاتِنَا ۚ فَاقْصُصِ الْقَصَصَ لَعَلَّهُمْ يَتَفَكَّرُونَ ﴿١٧٦﴾ سَاءَ مَثَلًا الْقَوْمُ الَّذِينَ كَذَّبُوا بِآيَاتِنَا وَأَنفُسَهُمْ كَانُوا يَظْلِمُونَ ﴿١٧٧﴾ مَن يَهْدِ اللَّهُ فَهُوَ الْمُهْتَدِي ۖ وَمَن يُضْلِلْ فَأُولَٰئِكَ هُمُ الْخَاسِرُونَ ﴿١٧٨﴾

(١٧١) یادی ئەو کاتەش بکەرەوە کە کێوی طورمان لەجێی خۆی هەڵکەندو لە شوێنی خۆی بەرزمان کردەوە بەسەریاندا وەکو پەڵەهەورێک، جا ئەوکاتە (بەتەواوی ترسیان لێنیشت و) وایانزانی کە دەکەوێت بەسەریاندا، (ئەوسا پێمان وتن) دە ئیتر ئەوەی پێمان بەخشیوون بەتوندی بیگرن و لە سنوور دەرمەچن و ئەو فەرمانانەی کە پێماندراون هەمیشە لە یادتان بێت، بۆ ئەوەی ئێوە خۆتان بپارێزن.

(١٧٢) یادی ئەوکاتەش بکەرەوە کەپەروەردگارت پشتاو پشتی نەوەی ئادەمی کۆ کردەوە (لەجیهانی پەنهان و شاراوەدا پەیمانی لێ وەرگرتن)و کردنی بە شایەت بەسەر خۆیانەوە و(پێی فەرموون): ئایا من پەروەردگاری ئێوە نیم؟! هەموو وتیان: نابێت تۆ خوای ئێمە نەبیت، بەڵێ شایەتیمان داوە(کە تۆ پەروەردگارمانیت)، ئەمەش بۆ ئەوەی نەوەکو لە رۆژی قیامەتدا بڵێن: بەڕاستی ئێمە لەمە بێئاگا بوین!!

(١٧٣) یاخود نەوەک بڵێن: جا ئێمە چیبکەین، بەراستی باوو باپیرانمان لە پێشدا هاوەڵیان بۆ خوا داناوە و ئێمەش نەوەیەک بووین دوای ئەوان هاتین و شوێنیان کەوتین، جا ئایا تۆ لەناومان دەبەیت بەهۆی ئەوەی کە پێشێلکارانی حەق کردوویانە؟

(١٧٤) ئا بەوشێوەیە ئایەت و فەرمانەکان ڕووندەکەینەوە (تالێی ورد ببنەوە)و بۆ ئەوەی بگەڕێنەوە (بۆ سەر راستە شەقامی ئیمان و خواناسین).

(١٧٥) (ئەی محمد ﷺ) هەواڵی ئەو کەسەیان بەسەردا بخوێنەرەوە کە فەرمانەکانی خۆمانمان پێبەخشی بوو، کەچی ئەویش خۆی لێ دامالّی و خۆی لێ دوورە پەرێز گرت، ئەوسا ئیتر شەیتان شوێنی کەوت و دایەپێش و چووە ریزی سەر لێشێواوانەوە.

(١٧٦) خۆ ئەگەر بمانویستایە ئەوە بەو ئایەت و فەرمانانە بەرزمان دەکردەوە، بەلام ئەو خۆی چەسپان بەزەویەوە و (دەستی کرد بەدنیا پەرستی و) شوێنی ئارەزووی خۆی کەوت، جا نموونەی (ئەو جۆرە کەسانە) وەکو نموونەی سەگ وایە ئەگەر دەری بکەیت و پیایدا هەڵبشاخێیت هەناسە برکێیەتی (زمان دەردەکێشێت)، یاخود ئەگەر وازی لێ بهێنیت ئەوە هەر هەناسە برکێیەتی، ئەوە نموونەی ئەو کەسانەیە کە ئایەتەکانی ئێمەیان بەدرۆ زانیوە و بڕوایان پێی نەبووە، کەوابوو ئەم جۆرە بەسەرهاتانە بگێرەرەوە بۆ ئەوەی (دابچڵەکێن و) بیربکەنەوە.

(١٧٧) ئای کە چەندە نموونەیەکی ناشیرینە، نموونەی ئەو کەسانەی کە بەڵگەو فەرمانەکانی ئێمەیان بەدرۆ زانیوەو بڕوایان پێ نەکردوە، ئەوانە هەر ستەمیان لە خۆیان دەکرد.

(١٧٨) ئەوەی خوا ڕێنموویی بکات ئەوە هەر ئەو ڕێنموویی وەرگرە، ئەوەش کەگومرای بکات ئەوە هەر ئەوانە زەرەرمەندن.

وَلَقَدْ ذَرَأْنَا لِجَهَنَّمَ كَثِيرًا مِّنَ الْجِنِّ وَالْإِنسِ لَهُمْ قُلُوبٌ لَّا يَفْقَهُونَ بِهَا وَلَهُمْ أَعْيُنٌ لَّا يُبْصِرُونَ بِهَا وَلَهُمْ آذَانٌ لَّا يَسْمَعُونَ بِهَا أُولَٰئِكَ كَالْأَنْعَامِ بَلْ هُمْ أَضَلُّ أُولَٰئِكَ هُمُ الْغَافِلُونَ ﴿١٧٩﴾ وَلِلَّهِ الْأَسْمَاءُ الْحُسْنَىٰ فَادْعُوهُ بِهَا وَذَرُوا الَّذِينَ يُلْحِدُونَ فِي أَسْمَائِهِ سَيُجْزَوْنَ مَا كَانُوا يَعْمَلُونَ ﴿١٨٠﴾ وَمِمَّنْ خَلَقْنَا أُمَّةٌ يَهْدُونَ بِالْحَقِّ وَبِهِ يَعْدِلُونَ ﴿١٨١﴾ وَالَّذِينَ كَذَّبُوا بِآيَاتِنَا سَنَسْتَدْرِجُهُم مِّنْ حَيْثُ لَا يَعْلَمُونَ ﴿١٨٢﴾ وَأُمْلِي لَهُمْ إِنَّ كَيْدِي مَتِينٌ ﴿١٨٣﴾ أَوَلَمْ يَتَفَكَّرُوا مَا بِصَاحِبِهِم مِّن جِنَّةٍ إِنْ هُوَ إِلَّا نَذِيرٌ مُّبِينٌ ﴿١٨٤﴾ أَوَلَمْ يَنظُرُوا فِي مَلَكُوتِ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَمَا خَلَقَ اللَّهُ مِن شَيْءٍ وَأَنْ عَسَىٰ أَن يَكُونَ قَدِ اقْتَرَبَ أَجَلُهُمْ فَبِأَيِّ حَدِيثٍ بَعْدَهُ يُؤْمِنُونَ ﴿١٨٥﴾ مَن يُضْلِلِ اللَّهُ فَلَا هَادِيَ لَهُ وَيَذَرُهُمْ فِي طُغْيَانِهِمْ يَعْمَهُونَ ﴿١٨٦﴾ يَسْأَلُونَكَ عَنِ السَّاعَةِ أَيَّانَ مُرْسَاهَا قُلْ إِنَّمَا عِلْمُهَا عِندَ رَبِّي لَا يُجَلِّيهَا لِوَقْتِهَا إِلَّا هُوَ ثَقُلَتْ فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ لَا تَأْتِيكُمْ إِلَّا بَغْتَةً يَسْأَلُونَكَ كَأَنَّكَ حَفِيٌّ عَنْهَا قُلْ إِنَّمَا عِلْمُهَا عِندَ اللَّهِ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ النَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ ﴿١٨٧﴾

(١٧٩) سوێند بە خوا بێگومان ئێمە زۆر لە پەری و ئادەمیزادمان بۆ دۆزەخ دروست کردوە، ئەوانە دەزگای دڵیان هەیە و کەچی حەقی پێ تێناگەن، چاویشیان هەیە کەچی حەقی پێ نابینن، گوێیان هەیە کەچی حەقی پێ نابیستن، ئا ئەوانە وەکو ئاژەڵ وان (لە شوێنکەوتنی ئارەزوودا) بەڵکو ئەوانە وێڵ تریشن، ئا ئەوانە هەر غافڵ و بێ ئاگان لە حەق.

(١٨٠) هەر بۆ خوایە هەموو ناوە جوان و پیرۆزەکان، جا (ئەی ئیمانداران) بەو ناوانە دۆعا و نزا بکەن و هاناو هاوار بۆ ئەو زاتە بەرن، واز بهێنن لەوانەی کە لە ناوە پیرۆزەکانی خوادا لادان دەکەن و (سیفەت و ناوەکانی خوا بەکاردەهێنن بۆ غەیری خوا)، لەئایندەدا پاداشتی ئەو کارو کردەوانەیان وەردەگرن کە ئەنجامیان دەدا.

(١٨١) لەو خەڵکەش کە دروستمان کردوون کەسانێک هەن کە (ژیرو هۆشمەندن و شوێنی حەق دەکەون و) ڕێنمووی خەڵک دەکەن و شارەزایان دەکەن بە حەق و ڕاستی، هەر بەوحەقە خەڵکی ڕاست دەکەنەوە (لە لادان و سەرکەشی).

(١٨٢) ئەوانەش کە بەڵگە و نیشانە و بەرنامەی ئێمە بەدرۆ دەزانن، لەئایندەدا وردە وردە بەرەو تیاچوون دەیانبەین لە کات و شوێنێکدا کە ئەوان هەستی پێناکەن و نایزانن.

(١٨٣) من مۆڵەتیشیان دەدەم، بەڵام کە تۆڵەم لێسەندن بەڕاستی نەخشەو پلانی من توندو بەهێزە.

(١٨٤) باشە، ئەوە (ئەو خەڵکە) بیریان نەکردۆتەوە (لە گوفتارو ڕەفتاری محمد ﷺ) کە ئەو هاوەڵەیان هیچ نیشانەیەکی شێتی پێوە نیە، بەڵکو ئەو(بەڕێزە) هیچ شتێک نیە جگە بێدارکەرەوەیەکی ئاشکرا نەبێت.

(١٨٥) ئایا بۆ سەرنجیان نەداوە لەو هەموو دەسەڵاتە گەورەیەی خوا لە ئاسمانەکان و زەویداو ئەو هەموو شتانەی کە خوا بەدی هێناون؟ (بۆ ئەوەندە بێئاگان ؟) خۆ بەڕاستی نزیک بۆتەوە ئاکامیان، جا بە چ گوفتارێکی تر لە دوای قورئان باوەڕ دەهێنن؟

(١٨٦) ئەو کەسەی خوا گومڕای بکات (بەهۆی لاساری و بێ دینی خۆیەوە) ئەوە هیچ ڕێنموویکەرێکی نیە و خوایش لێیان دەگەڕێ لە ناو سەرگەردانی و سەرکەشی خۆیاندا بسوڕێنەوە.

(١٨٧) (ئەی محمد ﷺ) پرسیارت لێدەکەن دەربارەی قیامەت: کەی بەرپا دەبێت؟ پێیان بڵێ: بەڕاستی زانینی کاتی بەرپا بوونی هەر لای پەروەردگارمە، لەکاتێکدا کەس لە سات و کاتی خۆیدا دەری ناخات و بەرپای ناکات زاتی پەروەردگار نەبێت، بەرپا بوونی قیامەت زۆر گرانە و زۆر دەکەوێت لەسەر دانیشتوانی ئاسمانەکان و زەوی (چونکە شیرازەی هەمووی تێکدەچێت و لێکهەڵدەوەشێت) ڕۆژی قیامەت بەرپا نابێت کوتوپڕ نەبێت، لە پڕ یەخەتان پێدەگرێت، وا پرسیارت لێدەکەن هەر وەک تۆ زۆر عەوداڵی زانینی هاتنی ڕۆژی قیامەت بیت و پرسیاری زۆرت لە بارەیەوە کردبێت !! پێیان بڵێ: بەڕاستی زانینی بەرپا بوونی قیامەت تەنها لای خوایە، بەڵام زۆربەی خەڵکیش (ئەمە) نازانن.

قُل لَّآ أَمۡلِكُ لِنَفۡسِي نَفۡعٗا وَلَا ضَرًّا إِلَّا مَا شَآءَ ٱللَّهُۚ وَلَوۡ كُنتُ أَعۡلَمُ ٱلۡغَيۡبَ لَٱسۡتَكۡثَرۡتُ مِنَ ٱلۡخَيۡرِ وَمَا مَسَّنِيَ ٱلسُّوٓءُۚ إِنۡ أَنَا۠ إِلَّا نَذِيرٞ وَبَشِيرٞ لِّقَوۡمٖ يُؤۡمِنُونَ ﴿١٨٨﴾ ۞ هُوَ ٱلَّذِي خَلَقَكُم مِّن نَّفۡسٖ وَٰحِدَةٖ وَجَعَلَ مِنۡهَا زَوۡجَهَا لِيَسۡكُنَ إِلَيۡهَاۖ فَلَمَّا تَغَشَّىٰهَا حَمَلَتۡ حَمۡلًا خَفِيفٗا فَمَرَّتۡ بِهِۦۖ فَلَمَّآ أَثۡقَلَت دَّعَوَا ٱللَّهَ رَبَّهُمَا لَئِنۡ ءَاتَيۡتَنَا صَٰلِحٗا لَّنَكُونَنَّ مِنَ ٱلشَّٰكِرِينَ ﴿١٨٩﴾ فَلَمَّآ ءَاتَىٰهُمَا صَٰلِحٗا جَعَلَا لَهُۥ شُرَكَآءَ فِيمَآ ءَاتَىٰهُمَاۚ فَتَعَٰلَى ٱللَّهُ عَمَّا يُشۡرِكُونَ ﴿١٩٠﴾ أَيُشۡرِكُونَ مَا لَا يَخۡلُقُ شَيۡـٔٗا وَهُمۡ يُخۡلَقُونَ ﴿١٩١﴾ وَلَا يَسۡتَطِيعُونَ لَهُمۡ نَصۡرٗا وَلَآ أَنفُسَهُمۡ يَنصُرُونَ ﴿١٩٢﴾ وَإِن تَدۡعُوهُمۡ إِلَى ٱلۡهُدَىٰ لَا يَتَّبِعُوكُمۡۚ سَوَآءٌ عَلَيۡكُمۡ أَدَعَوۡتُمُوهُمۡ أَمۡ أَنتُمۡ صَٰمِتُونَ ﴿١٩٣﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ تَدۡعُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ عِبَادٌ أَمۡثَالُكُمۡۖ فَٱدۡعُوهُمۡ فَلۡيَسۡتَجِيبُواْ لَكُمۡ إِن كُنتُمۡ صَٰدِقِينَ ﴿١٩٤﴾ أَلَهُمۡ أَرۡجُلٞ يَمۡشُونَ بِهَآۖ أَمۡ لَهُمۡ أَيۡدٖ يَبۡطِشُونَ بِهَآۖ أَمۡ لَهُمۡ أَعۡيُنٞ يُبۡصِرُونَ بِهَآۖ أَمۡ لَهُمۡ ءَاذَانٞ يَسۡمَعُونَ بِهَاۗ قُلِ ٱدۡعُواْ شُرَكَآءَكُمۡ ثُمَّ كِيدُونِ فَلَا تُنظِرُونِ ﴿١٩٥﴾



(١٨٨) (ئەی محمد ﷺ) پێیان بڵـێ: کـە مـن نـاتوانم هیـچ قـازانج یـان زەرەرێـک بـەخۆم بگەیەنم مەگەر ویستی خوای لەسەربێت، خۆ ئەگەر غەیب و شاراوەکانم بزانیایە ئەوە چاکـەی زۆرم کۆدەکردەوە بۆخـۆم و هیـچ ناخۆشیەکیشم تـووش نـەدەبوو، مـن هیـچ شـتێک نیم تـەنیا ترسێنەرم (بۆ یاخیـەکان) و مژدەدەریشم بـۆ کەسانێک کە باوەڕ دەهێنن.

(١٨٩) خوا ئەو زاتەیە کە ئێوەی لەیەک نەفس و لەیـەک شت دروست کـردوەو هـەر لـەویش جووتەکەی بـەدی هێنـا، بۆئـەوەی ئـارامی لـەلا بگرێـت، جـا کـاتێک پیاوەکـە چـووە لای هاوسـەرەکەی، ئـەویش سـکی پڕبـوو بەکۆرپەلەیەکی سـووک، (تاماوەی ١٢٠ ڕۆژ) ئـافرەتەکەش تێپەڕی کرد بەو ماوەیـەدا، ئینجا کاتێک کە باری بەرەو سەنگینی دەچێت ئەو ژن ومێردە لـە خوا دەپاڕێنـەوەو دەڵێـن: خوایـە سوێند بـە تـۆ، ئەگـەر منداڵێکی بـاش و بـێ عـەیبمان پێببەخشیت، ئـەوە بەڕاسـتی لـە سوپاسگوزارانی تۆ دەبین.

(١٩٠) کەچی کاتێک نەوەی پاک و بێ عـەیبی پێ بەخشین ئەوان هاوەڵیان بۆ خوا دانا لـەوەی کە خوا پێی دابوون (بەخشینی منداڵ دەدەنە پاڵ هۆکارەکان، نەک دەسەڵاتی خـوا)، خـوا بـەرزترە لـەوەی کـە ئـەوان هاوبەشی بۆ بڕیار دەدەن.

(١٩١) ئایا کەسێک یان شتێک دەکەنە شەریک و هاوبەش کە نـاتوانێت هیـچ شـتێک دروسـت بکـات، لـەکاتێکدا خۆشیان دروستکراون و (هیچیان بەدەست نیە)...

(١٩٢) ئەوانە ناتوانن سەرکەوتن بەوان ببەخشن و ناشتوانن یارمەتی خۆیان بدەن و بەرگریی لە خۆیشیان بکەن.

(١٩٣) ئەگەر بانگیشیان بکەن بۆ ڕێبازی هیدایەت، ئەوە شوێنتان ناکەون، چوونیەکیشە بۆتان ئایا بانگتـان کردبـن، یان ئێوە بێ دەنگ بن (ناتوانن بیانهەژێنن ئەگەر خوا ویستی لەسەر نەبێت).

(١٩٤) بەڕاستی ئەوانەی ئێـوە هاواریـان لێدەکـەن جگەلـە خواو لێیـان دەپاڕێنـەوە، چـەند بەندەیـەکی وەک ئێـوەن (هیچیان بەدەست نیە) دە هاواریان لێ بکەن، بابێن بەدەمتانەوە، ئەگەر ئێوە ڕاست دەکەن (لەو داوایەتاندا).

(١٩٥) ئایا ئەو پەرستراوانە قاچیان هەیە پێی بڕۆن بەڕێوە؟ یان دەستیان هەیـە ڕای بوەشـێنن و ئـازاری نـەیارەکانی پێبدەن؟ یاخود چاویان هەیە پێی ببینـن؟ یـاخود گوێیـان هەیـە پێـی ببیسـتن؟ ئـەی محمـد ﷺ پێیـان بڵـێ: داوا لـە پەرستراوەکانتان بکەن و چیتان لە دەست دێت لە پیلان گێڕان بیکەن و مۆڵەتم مەدەن...

إِنَّ وَلِـۧىَ ٱللَّهُ ٱلَّذِى نَزَّلَ ٱلْكِتَـٰبَ ۖ وَهُوَ يَتَوَلَّى ٱلصَّـٰلِحِينَ ﴿١٩٦﴾ وَٱلَّذِينَ تَدْعُونَ مِن دُونِهِۦ لَا يَسْتَطِيعُونَ نَصْرَكُمْ وَلَآ أَنفُسَهُمْ يَنصُرُونَ ﴿١٩٧﴾ وَإِن تَدْعُوهُمْ إِلَى ٱلْهُدَىٰ لَا يَسْمَعُوا۟ ۖ وَتَرَىٰهُمْ يَنظُرُونَ إِلَيْكَ وَهُمْ لَا يُبْصِرُونَ ﴿١٩٨﴾ خُذِ ٱلْعَفْوَ وَأْمُرْ بِٱلْعُرْفِ وَأَعْرِضْ عَنِ ٱلْجَـٰهِلِينَ ﴿١٩٩﴾ وَإِمَّا يَنزَغَنَّكَ مِنَ ٱلشَّيْطَـٰنِ نَزْغٌ فَٱسْتَعِذْ بِٱللَّهِ ۚ إِنَّهُۥ سَمِيعٌ عَلِيمٌ ﴿٢٠٠﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ ٱتَّقَوْا۟ إِذَا مَسَّهُمْ طَـٰٓئِفٌ مِّنَ ٱلشَّيْطَـٰنِ تَذَكَّرُوا۟ فَإِذَا هُم مُّبْصِرُونَ ﴿٢٠١﴾ وَإِخْوَٰنُهُمْ يَمُدُّونَهُمْ فِى ٱلْغَىِّ ثُمَّ لَا يُقْصِرُونَ ﴿٢٠٢﴾ وَإِذَا لَمْ تَأْتِهِم بِـَٔايَةٍ قَالُوا۟ لَوْلَا ٱجْتَبَيْتَهَا ۚ قُلْ إِنَّمَآ أَتَّبِعُ مَا يُوحَىٰٓ إِلَىَّ مِن رَّبِّى ۚ هَـٰذَا بَصَآئِرُ مِن رَّبِّكُمْ وَهُدًى وَرَحْمَةٌ لِّقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ ﴿٢٠٣﴾ وَإِذَا قُرِئَ ٱلْقُرْءَانُ فَٱسْتَمِعُوا۟ لَهُۥ وَأَنصِتُوا۟ لَعَلَّكُمْ تُرْحَمُونَ ﴿٢٠٤﴾ وَٱذْكُر رَّبَّكَ فِى نَفْسِكَ تَضَرُّعًا وَخِيفَةً وَدُونَ ٱلْجَهْرِ مِنَ ٱلْقَوْلِ بِٱلْغُدُوِّ وَٱلْـَٔاصَالِ وَلَا تَكُن مِّنَ ٱلْغَـٰفِلِينَ ﴿٢٠٥﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ عِندَ رَبِّكَ لَا يَسْتَكْبِرُونَ عَنْ عِبَادَتِهِۦ وَيُسَبِّحُونَهُۥ وَلَهُۥ يَسْجُدُونَ ۩ ﴿٢٠٦﴾



(١٩٦) (هەروەها بڵێ): بەڕاستی پشت و پەنای من ئەو خوایەیە کە قورئانی دابەزاندوەو لەکاتێکدا ئەو زاتە سەرپەرشتی چاکان و پاکان دەکات.

(١٩٧) ئەوانەی کە ئێوە جگە لە خوا هاناو هاواریان بۆ دەبەن ناتوانن سەرکەوتوتان بکەن، (تەنانەت) ناتوانن یارمەتی خۆیشیان بدەن.

(١٩٨) خۆ ئەگەر بانگیان بکەیت بۆ ڕێبازی هیدایەت، ئەوە (بانگەوازت) نابیستن (چ جای ئەوەی یارمەتیشت بدەن)، تۆ دەیانبینیت ئەوان سەیرت دەکەن، لەکاتێکدا کە نابینن.

(١٩٩) کاری ئاسان لەخەڵکی داوا بکەو چاوپۆشی لە هەڵەو کەموکوڕیەکانیان بکەو، فەرمان بدە بە چاکەو کردەوەیەک کە پەسەندی شەرعە، ڕووش وەرگێڕەو پشت بکە لە نەفام و تێ نەگەیشتوان.

(٢٠٠) ئەگەر وەسوەسەیەکت لەلایەن شەیتانەوە بۆ پێشهات و ویستی لە خشتەت بەرێت و تووشی هەڵەت بکات، جا ئەوە تۆ پەنا بگرە بەخواو پشت بەو ببەستە، چونکە بەڕاستی ئەو زاتە بیسەر و زانایە.

(٢٠١) بەڕاستی ئەوانەی کە پارێزکار و تەقوادار بوون، کاتێک خەتەرەو خەیاڵێک لەلایەن شەیتانەوە تووشیان بێت، ئەوە خێرا بێدار دەبنەوە و خوای خۆیان بیر دەکەوێتەوە و هۆشیار دەبنەوە، ئیتر دەستبەجێ بینا دەبن و بەرچاویان ڕوون دەبێت (ڕێبازی ڕاست بەدی دەکەن و لێیان ناشێوێت).

(٢٠٢) برا شەیتانەکانیشیان کۆمەکیان دەکەن لەگومڕایی کردنیان بەڕازاندنەوە و جوانکردنی گوناهو تاوانەکان، پاشان کۆڵ نادەن و کول نابن (لە گومڕایی کردنیاندا).

(٢٠٣) کاتێکیش تۆ (لەسەر داخوازیان)، بەڵگە و موعجیزەیەکیان بۆ نەهێنیت، ئەوە خوانەناسان (بەگاڵتە پێکردنەوە) دەڵێن: دەی بۆ هەڵت نەبەست و داتنەهێنا؟! بڵێ(ئەی محمد ﷺ من لەو کەسانە نیم کە خۆم شت هەڵبەستم) بەڕاستی من تەنها شوێنکەوتەی ئەو نیگایەم کە لە لایەن پەروەردگارمەوە بۆم دێت، ئەم قورئانەی (کە ئێوە باوەڕتان پێی نیە) چەندەها بەڵگەو بەرچاو ڕوونیە بۆ دڵەکان لە لایەن پەروەردگارتانەوە، هیدایەت بەخش و ڕەحمەتیشە بۆ ئەو کەسانەی کە باوەڕ دەهێنن.

(٢٠٤) کاتێکیش کە قورئان دەخوێندرێت، ئەوە گوێی بۆ بگرن و دڵی بدەنێ و بێ دەنگ بن، بۆ ئەوەی ئێوە ڕەحمەتان پێ بکرێت و پەروەردگار بەزەیی پێتاندا بێتەوە (گوێ گرتن بەدڵ و بێدەنگی کار کردی خۆی هەیە لەسەر بیسەر، بێجگە لە پاداشتی بێ سنوور).

(٢٠٥) یادی پەروەردگارت لە دڵ و دەروونی خۆتدا بە لالانەوەو ترسەوە بکەو، بێ دەنگ بەرز کردنەوە(لە نێوان چپە و ئاشکرادا)، لە بەیانیان و دەمە و ئێوارانداا، لە بێئاگایان مەبە (ئەوانەی دڵیان غافڵە).

(٢٠٦) بەڕاستی ئەوانەی لای پەروەردگارتن خۆیان بەگەورە ناگرن لە پەرستنی ئەو زاتەداو بەردەوام تەسبیحات و ستایشی دەکەن و سوژدە و کڕنووشی بۆ دەبەن (حەق وایە سەرجەم ئادەمیزادەکانیش چاو لەوان بکەن).



سورة الأنفال

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

يَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلْأَنفَالِ قُلِ ٱلْأَنفَالُ لِلَّهِ وَٱلرَّسُولِ فَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَأَصْلِحُوا۟ ذَاتَ بَيْنِكُمْ وَأَطِيعُوا۟ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥٓ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ ﴿١﴾ إِنَّمَا ٱلْمُؤْمِنُونَ ٱلَّذِينَ إِذَا ذُكِرَ ٱللَّهُ وَجِلَتْ قُلُوبُهُمْ وَإِذَا تُلِيَتْ عَلَيْهِمْ ءَايَٰتُهُۥ زَادَتْهُمْ إِيمَٰنًا وَعَلَىٰ رَبِّهِمْ يَتَوَكَّلُونَ ﴿٢﴾ ٱلَّذِينَ يُقِيمُونَ ٱلصَّلَوٰةَ وَمِمَّا رَزَقْنَٰهُمْ يُنفِقُونَ ﴿٣﴾ أُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُؤْمِنُونَ حَقًّا لَّهُمْ دَرَجَٰتٌ عِندَ رَبِّهِمْ وَمَغْفِرَةٌ وَرِزْقٌ كَرِيمٌ ﴿٤﴾ كَمَآ أَخْرَجَكَ رَبُّكَ مِنۢ بَيْتِكَ بِٱلْحَقِّ وَإِنَّ فَرِيقًا مِّنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ لَكَٰرِهُونَ ﴿٥﴾ يُجَٰدِلُونَكَ فِى ٱلْحَقِّ بَعْدَمَا تَبَيَّنَ كَأَنَّمَا يُسَاقُونَ إِلَى ٱلْمَوْتِ وَهُمْ يَنظُرُونَ ﴿٦﴾ وَإِذْ يَعِدُكُمُ ٱللَّهُ إِحْدَى ٱلطَّآئِفَتَيْنِ أَنَّهَا لَكُمْ وَتَوَدُّونَ أَنَّ غَيْرَ ذَاتِ ٱلشَّوْكَةِ تَكُونُ لَكُمْ وَيُرِيدُ ٱللَّهُ أَن يُحِقَّ ٱلْحَقَّ بِكَلِمَٰتِهِۦ وَيَقْطَعَ دَابِرَ ٱلْكَٰفِرِينَ ﴿٧﴾ لِيُحِقَّ ٱلْحَقَّ وَيُبْطِلَ ٱلْبَٰطِلَ وَلَوْ كَرِهَ ٱلْمُجْرِمُونَ ﴿٨﴾

## سوورەتی (الأنفـال)

بەناوی خوای بەخشندە و میهرەبان

(١) (ئەی محمد ﷺ) پرسیارت لیٚ دەکەن دەربارەی دەسکەوتەکان، تۆ بلیٚ: هەموو دەسکەوتەکان هی خواو پێغەمبەرن (هەر ئەوان بۆیان هەیە بڕیاری چۆنیەتی دابەش کردنی بدەن)، کەواتە لە خوا بترسن و چاکسازی نێوانی خۆتان بکەن (مەیەڵن لەسەر تەماعی دنیا نێوانتان بشێوێت) و فەرمانبەرداری خوا و پێغەمبەرەکەی بن، ئەگەر ئێوە ئیماندارن.

(٢) بێگومان ئیماندارانی راستەقینە تەنها ئەوانەن: (یەکەم) کە کاتێک ناوی خوا برا، ئەوە دڵەکانیان دەترسێت و دەهەژێت، (دووهەم) کاتێکیش ئایەت و فەرمانەکانی ئێمەیان بەسەردا بخوێنرێتەوە، ئەوە ئیمان و باوەڕیان زیاد دەکات، (سیٚهەم) (لە هەموو کارو بارێکیشیاندا) هەر پشت بە پەروەردگاری خۆیان دەبەستن...

(٣) (چوارەم) ئەوانەن کە نوێژەکانیان بەچاکی ئەنجام دەدەن، (پێنجەم) هەندێک لەو رزق و رۆزیەی پێمانداون، دەبەخشن و سەرفی دەکەن...

(٤) ئا ئەوانە هەر خۆیان ئیماندارانی راستەقینەن، چەندەها پلەوپایەی بەرزیان بۆ هەیە لای پەروەردگاریان و لیٚخۆش بوون و رزق و رۆزی هەمیشەیی لەگەڵ رێزدا.

(٥) (شێوەی دابەش کردنی دەسکەوتەکانی غەزای بەدر هەندیٚ موسڵمان پێی دڵگران بوون) وەکٚ چۆن پەروەردگارت بە حەق و راستی لە نێو ماڵەکەت دەری هێنایت لەکاتێکدا بەراستی کۆمەڵێکٚ لە بڕواداران پێی دڵگران بوون.

(٦) ئەو کۆمەڵە ئیمانداره موجادەلەت لەگەڵ دەکەن لە شتی راست و دروستدا، دوای روون بونەوەی (جەنگیان پیٚ ناخۆشە) وەکٚ بدرێنە بەر بۆ مردن لەکاتێکدا بەچاوی خۆیان هۆکاری مەرگٚ ببینن.

(٧) یادی ئەو کاتە بکەنەوە خوا بەڵێنی پێدابوون کە یەکێکٚ لەو دوو دەستەیە بەراستی بۆ ئێوە دەبێت (یان کاروانەکە یان سەرکەوتن بەسەر لەشکرەکەدا) ئێوەش بەراستی ئاواتە خوازن و حەز دەکەن کاروانە بیٚ چەکٚ و ئاسانەکە بۆ ئێوە بێت، خوایش دەیەوێت حەق و راستی بەفەرمانەکانی خۆی بچەسپێنێت و کافرانیش بنەبڕ بکات و ریشەکەنیان بکات...

(٨) بۆ ئەوەی حەق و راستی بچەسپێنێت و بەتاڵ و ناحەقیش پووچ بکاتەوە و لەناوی ببات، هەر چەندە تاوانبارو تاوانکاران پێیان ناخۆشە.

إِذْ تَسْتَغِيثُونَ رَبَّكُمْ فَاسْتَجَابَ لَكُمْ أَنِّي مُمِدُّكُم بِأَلْفٍ مِّنَ الْمَلَائِكَةِ مُرْدِفِينَ ﴿٩﴾ وَمَا جَعَلَهُ اللَّهُ إِلَّا بُشْرَىٰ وَلِتَطْمَئِنَّ بِهِ قُلُوبُكُمْ ۚ وَمَا النَّصْرُ إِلَّا مِنْ عِندِ اللَّهِ ۚ إِنَّ اللَّهَ عَزِيزٌ حَكِيمٌ ﴿١٠﴾ إِذْ يُغَشِّيكُمُ النُّعَاسَ أَمَنَةً مِّنْهُ وَيُنَزِّلُ عَلَيْكُم مِّنَ السَّمَاءِ مَاءً لِّيُطَهِّرَكُم بِهِ وَيُذْهِبَ عَنكُمْ رِجْزَ الشَّيْطَانِ وَلِيَرْبِطَ عَلَىٰ قُلُوبِكُمْ وَيُثَبِّتَ بِهِ الْأَقْدَامَ ﴿١١﴾ إِذْ يُوحِي رَبُّكَ إِلَى الْمَلَائِكَةِ أَنِّي مَعَكُمْ فَثَبِّتُوا الَّذِينَ آمَنُوا ۚ سَأُلْقِي فِي قُلُوبِ الَّذِينَ كَفَرُوا الرُّعْبَ فَاضْرِبُوا فَوْقَ الْأَعْنَاقِ وَاضْرِبُوا مِنْهُمْ كُلَّ بَنَانٍ ﴿١٢﴾ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ شَاقُّوا اللَّهَ وَرَسُولَهُ ۚ وَمَن يُشَاقِقِ اللَّهَ وَرَسُولَهُ فَإِنَّ اللَّهَ شَدِيدُ الْعِقَابِ ﴿١٣﴾ ذَٰلِكُمْ فَذُوقُوهُ وَأَنَّ لِلْكَافِرِينَ عَذَابَ النَّارِ ﴿١٤﴾ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِذَا لَقِيتُمُ الَّذِينَ كَفَرُوا زَحْفًا فَلَا تُوَلُّوهُمُ الْأَدْبَارَ ﴿١٥﴾ وَمَن يُوَلِّهِمْ يَوْمَئِذٍ دُبُرَهُ إِلَّا مُتَحَرِّفًا لِّقِتَالٍ أَوْ مُتَحَيِّزًا إِلَىٰ فِئَةٍ فَقَدْ بَاءَ بِغَضَبٍ مِّنَ اللَّهِ وَمَأْوَاهُ جَهَنَّمُ ۖ وَبِئْسَ الْمَصِيرُ ﴿١٦﴾

(٩) یادی ئەوکاتە بکەنەوە کەلە پەروەردگارتان دەپاڕانەوە و داوای یارمەتیتان لیّ دەکرد، خوایش خێرا هات بە هاناتانەوە و فەرمووی بەڕاستی من بەهەزار فریشتەی تر یارمەتی و کۆمەکیتان دەکەم بەشوێن ئەوانی تردا.

(١٠) ئەم یارمەتیەش جگەلە مژدەیەکی خوایی شتێکی تر نەبوو، تا دڵەکانیشتان ئارام بگرێت و دڵنیابن بەو یارمەتیە، ئەگینا سەرکەوتن تەنها لە لایەن خواوە نەبێت نیە، چونکە بەڕاستی هەر خوا خۆی باڵادەست و دانایە.

(١١) ئەو مژدە و ئارامی دڵە کاتێک بوو کە خوای گەورە بەوەنەوز دایگرتن، بۆ ئەوەی هێمنیەک بێت بۆتان لەلایەن خۆیەوە و ئاوێکیشی لە ئاسمانەوە بەسەرتاندا باراند بۆ ئەوەی خاوێنتان بکاتەوە پێی و پۆخڵی شەیتانتان لیّ دوور بخاتەوە (تا لە رووی جەستە و دڵ و دەروونەوە خاوێن بن)و دڵەکانتان بەهێزو دامەزراو بکات و بیانبەستێت بە خواوە و بەو ئاوە پێیەکانیشتان جێگیرو قایم بکات.

(١٢) ئەی محمد ﷺ یادی ئەوە بکەرەوە کاتێک پەروەردگارت وەحی و نیگای دەکرد بۆ فریشتەکان کە: بەڕاستی من یارو یاوەرتانم، کەوابوو ئێوەش دڵی ئیمانداران پابەندو دامەزراو بکەن، لەمەودوا منیش ترس و بیم دەخەمە دڵی ئەوانەی کە بیّباوەڕ بوون، دە ئێوەش لە سەرووی گەردنی ناپاکان بدەن و دەست بوەشێنن لە هەموو سەرپەنجەکانیان (تا کافرەکان شمشێریان پیّ نەگیرێت).

(١٣) ئەوە لەبەر ئەوە بوو چونکە بەڕاستی ئەوان دژایەتی و سەرپێچی خواو پێغەمبەرەکەیان کرد، هەر کەسیش دژایەتی و سەرپێچی خواو پێغەمبەرەکەی بکات، ئەوە بەڕاستی خوا تۆڵەسێنەرێکی بەزەبرە.

(١٤) ئەوەتە (تۆڵەی خواتان) جا ئێوەش بچێژن و بێگومان سزای ئاگری دۆزەخ هەمیشە هەر بۆ بیّباوەڕانە.

(١٥) ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە کاتێک بەرەنگاری ئەوانە بوونەوە کە بیّباوەڕ بوون لەکاتی لەشکرکێشیدا ئەوە پشتیان تێمەکەن و رامەکەن...

(١٦) هەرکەس لەو رۆژەدا رابکاتە دواوە و پشتیان تێبکات ئەوە بەڕاستی لەگەڵ خەشم و قینی خوادا گەڕاوەتەوە و سەرەنجام جیّ و رێگەی دۆزەخە کە ناخۆشترین جێگە و سەرئەنجامە مەگەر مەبەستی بەکارهێنانی هونەری جەنگ بێت یاخود مەبەستی شوێن گۆڕین و جیّ گۆڕکیّ بێت بۆ لای دەستەیەکی تر.

فَلَمْ تَقْتُلُوهُمْ وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ قَتَلَهُمْ ۚ وَمَا رَمَيْتَ إِذْ رَمَيْتَ وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ رَمَىٰ ۚ وَلِيُبْلِيَ ٱلْمُؤْمِنِينَ مِنْهُ بَلَآءً حَسَنًا ۚ إِنَّ ٱللَّهَ سَمِيعٌ عَلِيمٌ ﴿١٧﴾ ذَٰلِكُمْ وَأَنَّ ٱللَّهَ مُوهِنُ كَيْدِ ٱلْكَٰفِرِينَ ﴿١٨﴾ إِن تَسْتَفْتِحُوا۟ فَقَدْ جَآءَكُمُ ٱلْفَتْحُ ۖ وَإِن تَنتَهُوا۟ فَهُوَ خَيْرٌ لَّكُمْ ۖ وَإِن تَعُودُوا۟ نَعُدْ وَلَن تُغْنِيَ عَنكُمْ فِئَتُكُمْ شَيْـًٔا وَلَوْ كَثُرَتْ وَأَنَّ ٱللَّهَ مَعَ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴿١٩﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ أَطِيعُوا۟ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ وَلَا تَوَلَّوْا۟ عَنْهُ وَأَنتُمْ تَسْمَعُونَ ﴿٢٠﴾ وَلَا تَكُونُوا۟ كَٱلَّذِينَ قَالُوا۟ سَمِعْنَا وَهُمْ لَا يَسْمَعُونَ ﴿٢١﴾ ۞ إِنَّ شَرَّ ٱلدَّوَآبِّ عِندَ ٱللَّهِ ٱلصُّمُّ ٱلْبُكْمُ ٱلَّذِينَ لَا يَعْقِلُونَ ﴿٢٢﴾ وَلَوْ عَلِمَ ٱللَّهُ فِيهِمْ خَيْرًا لَّأَسْمَعَهُمْ ۖ وَلَوْ أَسْمَعَهُمْ لَتَوَلَّوا۟ وَّهُم مُّعْرِضُونَ ﴿٢٣﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱسْتَجِيبُوا۟ لِلَّهِ وَلِلرَّسُولِ إِذَا دَعَاكُمْ لِمَا يُحْيِيكُمْ ۖ وَٱعْلَمُوٓا۟ أَنَّ ٱللَّهَ يَحُولُ بَيْنَ ٱلْمَرْءِ وَقَلْبِهِۦ وَأَنَّهُۥٓ إِلَيْهِ تُحْشَرُونَ ﴿٢٤﴾ وَٱتَّقُوا۟ فِتْنَةً لَّا تُصِيبَنَّ ٱلَّذِينَ ظَلَمُوا۟ مِنكُمْ خَآصَّةً ۖ وَٱعْلَمُوٓا۟ أَنَّ ٱللَّهَ شَدِيدُ ٱلْعِقَابِ ﴿٢٥﴾



(١٧) كەوابوو ئەی ئیمانداران: وەنەبێت ئێوە کافرانتان کوشتبێت، بەڵکو خوا کوشتنی و لەناوی بردوون، تۆش ئەی محمد ﷺ کاتێک مشتێک خۆڵت روو بەکافران فڕێدا ئەو کارە تەنها تۆ نەتکرد، بەڵکو خوا فڕێیداو (خۆڵی کردە چاوی کافرانەوە)، تا ئیمانداران تاقی بکاتەوە بە تاقی کردنەوەیەکی چاک، چونکە بەڕاستی خوا بیسەری (دوعاو نزایانە)، زاناشە (بەنیەتی دڵیان).

(١٨) ئەو سەرکەوتن و پشتیوانیە بۆ ئێوەی ئیماندارە، دڵنیاش بن کە خوا ریسواکەری پیلانی بێباوەڕانە.

(١٩) ئیمانداران ئەگەر ئێوە داوای یارمەتی و سەرکەوتن دەکەن ئەوە بەڕاستی سەرکەوتنتان بۆ هات و ئەگەر وازبهێنن لە سەرپێچی فەرمانەکانی پێغەمبەر ئەوە چاکترە بۆتان، خۆئەگەر بگەڕێنەوە بۆ سەرپێچی کردن، ئێمەش دەگەڕێینەوە بۆ شکست پێدانتان، ئەوکاتە دەستەو تاقمتان هەرگیز هیچ سوودێکتان پێناگەیەنێت هەرچەند زۆریش بێت (ژمارەتان) چونکە لە ڕاستیشدا هەمیشە خوا لەگەڵ ئیماندارانی دامەزراو و لێبڕاودایە.

(٢٠) ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە، فەرمانبەرداری خواو پێغەمبەرەکەی بن و لە بەرنامەی ئەوزاتە پشت هەڵمەکەن، لەکاتێکدا ئێوە تێدەگەن و دەبیسن.

(٢١) وەک ئەو کەسانەش مەبن (بەسەر زارەکی) دەیانوت: تێگەیشتین و بیستمان، گوێرایەڵین، لەکاتێکدا ئەوان نابیستن و تێناگەن(چونکە دڵ ومێشکی خۆیان داخستووە).

(٢٢) بەڕاستی خراپترین زیندەوەران لای خوا ئەو کەسانەن کە کەڕن (حەق نابیستن) و لاڵن (حەق بێژ نین)، ئەوانەی کە ژیر نابن (بیرو هۆشیان ناخەنەکارو تێنافکرن و بیرو مێشکیان قفڵ داوە).

(٢٣) خۆ ئەگەر خوا خێری تیادا بەدی بکردنایە، ئەوە وای لێدەکردن کە حەق و راستی ببیستن، خۆ ئەگەر حەقیشیان پێ ببیستنایە (کە ئامادەنین بۆ وەرگرتنی) ئەوە هەر پشت لە بەرنامەی خوا دەکەن لەکاتێکدا ئەوان هەمیشە نەیارن.

(٢٤) ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە، بەدەم بانگەوازی خواو پێغەمبەرەوە بچن کاتێک بانگتان دەکات بۆ بەرنامە و ڕێبازێک کە دەتانژێنێتەوە و ژیان بەخشە، چاک بزانن بەڕاستی خوا (زۆر بەئاسانی) دەتوانێت دەسەڵاتی بکەوێتە نێوان ئادەمیزاد و (ئاواتەکانی) دڵیەوە (بەگۆڕینیان)، (بیرتان نەچێت) بەڕاستی هەر بۆ لای ئەویش کۆدەکرێنەوە.

(٢٥) هەروەها خۆتان بپارێزن لە بەڵایەک تووشی ئەوانەتان نابێت بەتایبەت کە ستەمیان کردوە (بەڵکو هەمووان دەگرێتەوە)، بشزانن کە بەڕاستی خوا تۆڵەی زۆر بە زەبرە.

وَٱذْكُرُوٓا۟ إِذْ أَنتُمْ قَلِيلٌ مُّسْتَضْعَفُونَ فِى ٱلْأَرْضِ تَخَافُونَ
أَن يَتَخَطَّفَكُمُ ٱلنَّاسُ فَـَٔاوَىٰكُمْ وَأَيَّدَكُم بِنَصْرِهِۦ وَرَزَقَكُم
مِّنَ ٱلطَّيِّبَٰتِ لَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ ﴿٢٦﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟
لَا تَخُونُوا۟ ٱللَّهَ وَٱلرَّسُولَ وَتَخُونُوٓا۟ أَمَٰنَٰتِكُمْ وَأَنتُمْ تَعْلَمُونَ
﴿٢٧﴾ وَٱعْلَمُوٓا۟ أَنَّمَآ أَمْوَٰلُكُمْ وَأَوْلَٰدُكُمْ فِتْنَةٌ وَأَنَّ ٱللَّهَ
عِندَهُۥٓ أَجْرٌ عَظِيمٌ ﴿٢٨﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ إِن تَتَّقُوا۟
ٱللَّهَ يَجْعَل لَّكُمْ فُرْقَانًا وَيُكَفِّرْ عَنكُمْ سَيِّـَٔاتِكُمْ وَيَغْفِرْ
لَكُمْ ۗ وَٱللَّهُ ذُو ٱلْفَضْلِ ٱلْعَظِيمِ ﴿٢٩﴾ وَإِذْ يَمْكُرُ بِكَ ٱلَّذِينَ
كَفَرُوا۟ لِيُثْبِتُوكَ أَوْ يَقْتُلُوكَ أَوْ يُخْرِجُوكَ ۚ وَيَمْكُرُونَ وَيَمْكُرُ
ٱللَّهُ ۖ وَٱللَّهُ خَيْرُ ٱلْمَٰكِرِينَ ﴿٣٠﴾ وَإِذَا تُتْلَىٰ عَلَيْهِمْ ءَايَٰتُنَا
قَالُوا۟ قَدْ سَمِعْنَا لَوْ نَشَآءُ لَقُلْنَا مِثْلَ هَٰذَآ ۙ إِنْ هَٰذَآ إِلَّآ
أَسَٰطِيرُ ٱلْأَوَّلِينَ ﴿٣١﴾ وَإِذْ قَالُوا۟ ٱللَّهُمَّ إِن كَانَ هَٰذَا
هُوَ ٱلْحَقَّ مِنْ عِندِكَ فَأَمْطِرْ عَلَيْنَا حِجَارَةً مِّنَ ٱلسَّمَآءِ
أَوِ ٱئْتِنَا بِعَذَابٍ أَلِيمٍ ﴿٣٢﴾ وَمَا كَانَ ٱللَّهُ لِيُعَذِّبَهُمْ
وَأَنتَ فِيهِمْ ۚ وَمَا كَانَ ٱللَّهُ مُعَذِّبَهُمْ وَهُمْ يَسْتَغْفِرُونَ ﴿٣٣﴾

(٢٦) یادی ئەوکاتە بکەنەوە کە ئێوە زۆر کەم و لاوازکراوو بێ هێزبوون لەزەویدا، دەترسان کە خەڵکی بتانڕفێنن (بتانکوژن یان ئازارتان بدەن) جاخوای باڵادەست جێ و ڕێی بۆ سازکردن و بەهێزی کردن بەسەرکەوتن و یارمەتی خۆی و لە رزق و رۆزیی و نازو نیعمەتە پاکەکان بەهرەوەری کردن بۆ ئەوەی سوپاسگوزاری بکەن. (ئەمەش مژدەیەکی بەردەوامە و پشت بەخوا بەم زووانە دێتەوە دی).

(٢٧) ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە: خیانەت مەکەن لە خواو لە پێغەمبەر ﷺ (بەوەی کەم تەرخەمیتان لە فەرمانبەرداریاندا)، هەروەها خیانەتیش مەکەن لە ئەمانەت و سپاردەکانتان کە پێتان دەسپێردرێت، لەکاتێکدا کە ئێوە دەزانن (ئەو کارەتان خیانەتە).

(٢٨) هەروەها بزانن بەراستی ماڵ و سامان و منداڵتان بۆ تاقیکردنەوەیە، بەراستی خوای میهرەبانیش پاداشتی زۆرو بێ سنووری لە لایە (بۆ ئەو کەسانەی کە نایەڵن ماڵ و سامان و منداڵیان ببێتە کۆسپ لە ڕێگەی جیهاد و هەوڵ و خەبات و کۆششیاندا).

(٢٩) ئەی ئەو کەسانەی باوەڕتان هێناوە: ئەگەر تەقوای خوا بکەن و پارێزکاری بکەن، ئەوە خوا بەرچاو ڕۆشنییەکی تەواوتان بۆ فەراهەم دەهێنێت (کە بتوانن حق و ناحەقی بەئاسانی لەیەک پێ جیابکەنەوە) هەروەها هەڵەو گوناهەکانیشتان دادەپۆشێت و لێتان خۆش دەبێت، (چونکە) خوا خاوەنی فەزڵ و ڕێزی گەورەو بێ سنوورە.

(٣٠) (ئەی محمد ﷺ یادی ئەو کاتە بکەرەوە) کاتێک ئەوانەی بێ باوەڕ بوون پیلانیان دەگێڕا دژی تۆ بۆ ئەوەی بەندت بکەن، یان بتکوژن، یان دەرت بکەن، ئەوان پیلانی خۆیان دەگێڕن و خوایش پلانی خۆی دەخاتەکار (بەپووچ کردنەوەی کارەکانیان)، دڵنیابن خوای گەورە چاکترینی هەموو پلانسازو نەخشە سازانە (نایەڵێ پیلانیان سەربگرێ).

(٣١) کاتێکیش ئایەت و فەرمانەکانی ئێمە بەسەر بێ باوەڕاندا دەخوێنرێتەوە، ئەوە دەڵێن: بەراستی ئێمە بیستمان و ئەگەر بمانویستایە ئەوە وێنەی ئەوەمان دەگوت!!، ئەم بابەتانە جگە لە داستانی پێشینان شتێکی تر نیە!!

(٣٢) یادی ئەو کاتە بکەرەوە کە بێ باوەڕان وتیان: خوایە ئەگەر ئەم دین و بەرنامە و قورئانە ڕاستە، لەلایەن تۆیشەوە رەوانە کراوە، ئەوە بەرد لە ئاسمانەوە ببارێنە بەسەرماندا، یان بەڵاو سزایەکی بەئێشمان بۆ بهێنە!!.

(٣٣) بێگومان خوای گەورە (بەقسەی ئەوان ناکات) بەڵاو سزا نادات بەسەریاندا، لەکاتێکدا تۆ لەناویاندا بیت (بە ئومێدی ئەوەی کە هەندێکیان باوەڕ بهێنن)، هەروەها خوایش سزادەر نیە لەکاتێکدا ئەوان داوای لێخۆشبوون بکەن.

وَمَا لَهُمْ أَلَّا يُعَذِّبَهُمُ ٱللَّهُ وَهُمْ يَصُدُّونَ عَنِ ٱلْمَسْجِدِ ٱلْحَرَامِ وَمَا كَانُوٓا۟ أَوْلِيَآءَهُۥٓ ۚ إِنْ أَوْلِيَآؤُهُۥٓ إِلَّا ٱلْمُتَّقُونَ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَهُمْ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٣٤﴾ وَمَا كَانَ صَلَاتُهُمْ عِندَ ٱلْبَيْتِ إِلَّا مُكَآءً وَتَصْدِيَةً ۚ فَذُوقُوا۟ ٱلْعَذَابَ بِمَا كُنتُمْ تَكْفُرُونَ ﴿٣٥﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ يُنفِقُونَ أَمْوَٰلَهُمْ لِيَصُدُّوا۟ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ ۚ فَسَيُنفِقُونَهَا ثُمَّ تَكُونُ عَلَيْهِمْ حَسْرَةً ثُمَّ يُغْلَبُونَ ۗ وَٱلَّذِينَ كَفَرُوٓا۟ إِلَىٰ جَهَنَّمَ يُحْشَرُونَ ﴿٣٦﴾ لِيَمِيزَ ٱللَّهُ ٱلْخَبِيثَ مِنَ ٱلطَّيِّبِ وَيَجْعَلَ ٱلْخَبِيثَ بَعْضَهُۥ عَلَىٰ بَعْضٍ فَيَرْكُمَهُۥ جَمِيعًا فَيَجْعَلَهُۥ فِى جَهَنَّمَ ۚ أُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْخَٰسِرُونَ ﴿٣٧﴾ قُل لِّلَّذِينَ كَفَرُوٓا۟ إِن يَنتَهُوا۟ يُغْفَرْ لَهُم مَّا قَدْ سَلَفَ وَإِن يَعُودُوا۟ فَقَدْ مَضَتْ سُنَّتُ ٱلْأَوَّلِينَ ﴿٣٨﴾ وَقَٰتِلُوهُمْ حَتَّىٰ لَا تَكُونَ فِتْنَةٌ وَيَكُونَ ٱلدِّينُ كُلُّهُۥ لِلَّهِ ۚ فَإِنِ ٱنتَهَوْا۟ فَإِنَّ ٱللَّهَ بِمَا يَعْمَلُونَ بَصِيرٌ ﴿٣٩﴾ وَإِن تَوَلَّوْا۟ فَٱعْلَمُوٓا۟ أَنَّ ٱللَّهَ مَوْلَىٰكُمْ ۚ نِعْمَ ٱلْمَوْلَىٰ وَنِعْمَ ٱلنَّصِيرُ ﴿٤٠﴾

(٣٤) ئایا چی هەیە بۆ ئەوان کە خوا سزایان نەدات؟! لەکاتێکدا کە ئەوان ڕێگری دەکەن و نایەڵن خەڵکی ڕووبکاتە مزگەوتی حەرام (کەعبە)، ئەوانە هەر شایستەی ئەوە نین کە سەرپەشتیاری بن، هیچ تاقمێک شایستەی سەرپەرشتیاری کەعبە نیە بێجگە لە خواناس و پارێزکاران، بەلاّم زۆربەشیان (لەو ڕاستیانە) بێئاگان.

(٣٥) ئەوانە نزا و پاڕانەوەشیان لەلای ماڵی خوادا (کەعبەی پیرۆز) جگە لە فیکەکێشان و چەپڵە لێدان شتێکی تر نەبووە، کەوابوو بچێژن سزای کوشتن و دیلی (لە غەزای بەدردا) بەوەی کە ئێوە بێ باوەڕو لە خوا یاخی دەبوون.

(٣٦) بێگومان ئەوانەی بێباوەڕن، ماڵ و سامانی خۆیان بەخت دەکەن بۆ ئەوەی بەشێنەیی بەربەست دانێن و ڕێگری بکەن لە بەردەم ئاین و ڕێبازی خوادا، جا ماڵ و سامانیان لە ئایندەدا بۆ ئەو مەبەستە خەرج دەکەن! پاشان دەبێتە پەشیمانی و داخ وحەسرەت لەسەریان، لەدوایدا شکست دەهێنن، بێگومان ئەوانەش کە بێباوەڕن بوون بۆ دۆزەخ کۆ دەکرێنەوە و ڕاپێچ دەکرێن.

(٣٧) (بەسەرهات و ڕووداوەکان) بۆ ئەوەیە کە: خوا کەسانی دەروون پیس و ناپاک لەکەسانی دەروون خاوێن و پاک جیا بکاتەوە و پیس و ناپاکەکانیش لەسەریەک کەڵەکە بکات و هەموویان بدات بە ملی یەکدا بۆ ئەوەی کۆیان بکاتەوە بەگشتی، ئینجا فڕێیان بداتە ناو دۆزەخەوە، ئا ئەوانە هەر خۆیان خەسارەتمەند و زەرەرمەندن.

(٣٨) ئەی محمد ﷺ بەکافران بڵێ: ئەگەر کۆڵ بدەن و واز بهێنن و (باوەڕبهێنن)، ئەوە بێگومان چاوپۆشی لە گوناهی ڕابردوویان دەکرێت، خۆ ئەگەر بگەڕێنەوەو بەبەردەوامی دژایەتی (ئاینی خوا) بکەن، جا ئەوە بەڕاستی یاسای نەتەوە یاخی بووە پێشینەکانیان بەسەردا دەسەپێنرێت.

(٣٩) (ئەی ئیمانداران) ئێوەش بجەنگن دژ بەکافرو خوانەناسان تا فیتنە و ئاشوب و ئازاردانی موسڵمان نەمێنێت و (ئەو خەڵکە سەربەست بن لە هەڵبژاردنی بەرنامە و ئایندا)، تا دین و فەرمانبەرداری هەر هەمووی بۆ خوا بێت، جا ئەگەر بێ باوەڕان کۆڵ بدەن، ئەوە بابزانن بەڕاستی خوا بینایە بەهەموو ئەو کارو کردەوانەی کە دەیکەن.

(٤٠) خۆ ئەگەر ئەو خوانەناسانە هەر پشتهەڵکەن و واز نەهێنن، ئەوە بزانن کە خوا پشتیوان و سەرپەرشتیارتانە کە پشتیوانێکی چاک و یارمەتی دەرێکی چاکە.

۞ وَاعْلَمُوا أَنَّمَا غَنِمْتُم مِّن شَيْءٍ فَأَنَّ لِلَّهِ خُمُسَهُ وَلِلرَّسُولِ وَلِذِي الْقُرْبَىٰ وَالْيَتَامَىٰ وَالْمَسَاكِينِ وَابْنِ السَّبِيلِ إِن كُنتُمْ آمَنتُم بِاللَّهِ وَمَا أَنزَلْنَا عَلَىٰ عَبْدِنَا يَوْمَ الْفُرْقَانِ يَوْمَ الْتَقَى الْجَمْعَانِ ۗ وَاللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ ﴿٤١﴾ إِذْ أَنتُم بِالْعُدْوَةِ الدُّنْيَا وَهُم بِالْعُدْوَةِ الْقُصْوَىٰ وَالرَّكْبُ أَسْفَلَ مِنكُمْ ۚ وَلَوْ تَوَاعَدتُّمْ لَاخْتَلَفْتُمْ فِي الْمِيعَادِ ۙ وَلَٰكِن لِّيَقْضِيَ اللَّهُ أَمْرًا كَانَ مَفْعُولًا لِّيَهْلِكَ مَنْ هَلَكَ عَن بَيِّنَةٍ وَيَحْيَىٰ مَنْ حَيَّ عَن بَيِّنَةٍ ۗ وَإِنَّ اللَّهَ لَسَمِيعٌ عَلِيمٌ ﴿٤٢﴾ إِذْ يُرِيكَهُمُ اللَّهُ فِي مَنَامِكَ قَلِيلًا ۖ وَلَوْ أَرَاكَهُمْ كَثِيرًا لَّفَشِلْتُمْ وَلَتَنَازَعْتُمْ فِي الْأَمْرِ وَلَٰكِنَّ اللَّهَ سَلَّمَ ۗ إِنَّهُ عَلِيمٌ بِذَاتِ الصُّدُورِ ﴿٤٣﴾ وَإِذْ يُرِيكُمُوهُمْ إِذِ الْتَقَيْتُمْ فِي أَعْيُنِكُمْ قَلِيلًا وَيُقَلِّلُكُمْ فِي أَعْيُنِهِمْ لِيَقْضِيَ اللَّهُ أَمْرًا كَانَ مَفْعُولًا ۗ وَإِلَى اللَّهِ تُرْجَعُ الْأُمُورُ ﴿٤٤﴾ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِذَا لَقِيتُمْ فِئَةً فَاثْبُتُوا وَاذْكُرُوا اللَّهَ كَثِيرًا لَّعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ ﴿٤٥﴾

(٤١)(ئەی ئیمانداران) ئاگاداربن و بزانن کە: بەراستی هەرچیەکتان دەستکەوت (لە جەنگی بێ باوەڕاندا) ئەوە بێگومان پێنج یەکی بۆ خواو پێغەمبەرو خزمانی نزیکی پێغەمبەرو هەتیوان و هەژاران و ڕێبوارانە، (چوار بەشەکەی تریشی بۆ موجاهیدانە کە لەو غەزایەدا بەشدارییان کردووە) ئەگەر ئێوە باوەڕتان هەیە بە خواو بەوەی کە دامانبەزاندوە بۆ سەر بەندەمان (محمد ﷺ) لە ڕۆژی جیاکردنەوەکەدا (کە غەزای بەدرە) ئەو ڕۆژەی کە هەردوو لەشکر بەرەنگاری یەک بوون، خوایش بەسەر هەموو شتێکدا دەسەڵاتدارە...

(٤٢) کاتێک ئێوە لە دامێنی خواری شیوەکە و نزیکتر بوون بە مەدینە و ئەوانیش لە سەرەوەی شیوەکەوە بوون و دوورتر لە مەدینە، کاروانەکەش لە خوارترتانەوە بوو، خۆ ئەگەر بڕیارو بەڵێنتان بدایە بەیەکتر بگەن لەوکات و شوێنەدا ئەوە دوو بەرەکی لەنێوانتاندا دروست دەبوو، بەڵام خوا دەیەوێت بارودۆخێک پێش بهێنێت کە بڕیاری لەسەرداوە (کە سەرکەوتنی موسوڵمانانە و شکستی بێباوەڕانە)، بۆ ئەوەی لەناو بچێت و بەهانەی نەمێنێت ئەوەی کە لە زانستی خوادا لەناوچووە و بۆ ئەوەی بژی لەسەر بەرچاو ڕوونی و بەڵگە، ئەوەی لە زانستی خوادا دەژی لەسەر دینداری (سەرەنجامی شەڕی بەدر بۆ ئەوە بوو تا باوەڕو بێ باوەڕی بۆ هەردوولا ڕوون بێت)و بێگومان خوا بیسەرو زانایە.

(٤٣) کاتێک خوا ئەوانی لە خەوتدا بەکەم نیشان ئەدایت، خۆ ئەگەر ئەوانی بەژمارەیەکی زۆر نیشانی بدایتایە ئەوە ئێوە لاواز دەبوون و تووشی نەهامەتی و کێشە دەبوون لە بارەی جەنگ کردنەوە، بەڵام خوا بە سەلامەتی و سەرکەوتوویی لەو ترس و کێشەیە ڕزگاری کردن، چونکە بەڕاستی ئەو زاتە زانایە بەهەرچی لەناو دڵ و دەروون و سینەکاندا حەشار دراوە.

(٤٤) کاتێکیش بەیەکگەیشتن لە گۆڕەپانی جەنگدا لەبەرچاوی ئێوە، خوا ئەوانی بەکەم نیشان دەدان و ژمارەی ئێوەشی لەبەرچاوی ئەوان بە کەم دەنواند، بۆ ئەوەی هەر ئەوە پێش بێت کە خوا بڕیاری لەسەرداوە، هەر بۆ لای خوا سەرەنجامی هەموو کارو کردەوەیەک دەگێردرێتەوە.

(٤٥) ئەی ئەو کەسانەی ئیمان و باوەڕتان هێناوە: کاتێک دەگەنە دەستەیەک و ڕوو بە ڕووتان دەبنەوە، ئەوە دەبێت خۆڕاگربن و سەنگەر چۆڵ نەکەن و زۆر یادی خوا بکەن و لێی بپاڕێنەوە، بۆ ئەوەی ئێوە سەرفرازو سەرکەوتوو بن...

وَأَطِيعُوا۟ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ وَلَا تَنَٰزَعُوا۟ فَتَفْشَلُوا۟ وَتَذْهَبَ رِيحُكُمْ وَٱصْبِرُوٓا۟ إِنَّ ٱللَّهَ مَعَ ٱلصَّٰبِرِينَ ﴿٤٦﴾ وَلَا تَكُونُوا۟ كَٱلَّذِينَ خَرَجُوا۟ مِن دِيَٰرِهِم بَطَرًا وَرِئَآءَ ٱلنَّاسِ وَيَصُدُّونَ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ وَٱللَّهُ بِمَا يَعْمَلُونَ مُحِيطٌ ﴿٤٧﴾ وَإِذْ زَيَّنَ لَهُمُ ٱلشَّيْطَٰنُ أَعْمَٰلَهُمْ وَقَالَ لَا غَالِبَ لَكُمُ ٱلْيَوْمَ مِنَ ٱلنَّاسِ وَإِنِّى جَارٌ لَّكُمْ فَلَمَّا تَرَآءَتِ ٱلْفِئَتَانِ نَكَصَ عَلَىٰ عَقِبَيْهِ وَقَالَ إِنِّى بَرِىٓءٌ مِّنكُمْ إِنِّىٓ أَرَىٰ مَا لَا تَرَوْنَ إِنِّىٓ أَخَافُ ٱللَّهَ وَٱللَّهُ شَدِيدُ ٱلْعِقَابِ ﴿٤٨﴾ إِذْ يَقُولُ ٱلْمُنَٰفِقُونَ وَٱلَّذِينَ فِى قُلُوبِهِم مَّرَضٌ غَرَّ هَٰٓؤُلَآءِ دِينُهُمْ وَمَن يَتَوَكَّلْ عَلَى ٱللَّهِ فَإِنَّ ٱللَّهَ عَزِيزٌ حَكِيمٌ ﴿٤٩﴾ وَلَوْ تَرَىٰٓ إِذْ يَتَوَفَّى ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ يَضْرِبُونَ وُجُوهَهُمْ وَأَدْبَٰرَهُمْ وَذُوقُوا۟ عَذَابَ ٱلْحَرِيقِ ﴿٥٠﴾ ذَٰلِكَ بِمَا قَدَّمَتْ أَيْدِيكُمْ وَأَنَّ ٱللَّهَ لَيْسَ بِظَلَّٰمٍ لِّلْعَبِيدِ ﴿٥١﴾ كَدَأْبِ ءَالِ فِرْعَوْنَ وَٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ كَفَرُوا۟ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ فَأَخَذَهُمُ ٱللَّهُ بِذُنُوبِهِمْ إِنَّ ٱللَّهَ قَوِىٌّ شَدِيدُ ٱلْعِقَابِ ﴿٥٢﴾

(٤٦) گوێڕایەڵی خواو پێغەمبەرەکەشی بکەن لە هەموو کردارو گوفتارێکداو ئاشووب و ئاژاوە مەگێرن و مەچن بەگژ یەکدا، خۆ ئەگەر بچن بەگژ یەکداو یەکتر بشکێنن، ئەوە شکست و لاوازی رووتان تێدەکات و هەیبەت و شکۆداری و دەسەڵاتتان لەبەین دەچێت و دەبێت خۆگرو نەفەس درێژ بن (هەم لە مەیدانی جەنگدا، هەم لەناو یەکتردا) چونکە بەراستی خوا یارو یاوەری خۆگرو ئارامگرانە.

(٤٧) نەکەن وەک ئەو جۆرە کەسانە بن کە لە وڵات و شوێنی خۆیان دەرچوون لەبەر کەش و فش کردن و خۆ نواندن لەبەر چاوی خەڵک و دەیانویت کۆسپ بخەنە بەردەم رێبازو ئاینی خوا، لەکاتێکدا کە خوای گەورەش بەئاگایە بە سەرەتاو سەرەنجامی هەموو ئەو کاروکردەوانەی کە دەیکەن.

(٤٨) کاتێکیش شەیتان (بەوەسوەسە و خەیاڵ) هەموو کردەوە ناپەسەندو ناڕەواکانی بۆ رازاندنەوە، وتی: ئەمڕۆ هیچ کەس دەرەقەتی ئێوە نایەت و دڵنیابن منیش پشت و پەنام بۆ ئێوە، جا کاتێک ئەو دوو لەشکرە یەکتریان بینی، دەستبەجێ شەیتان پاشەو پاش گەڕایەوەو وتی: بەراستی من بەریم لە ئێوە! چونکە بەراستی ئەوەی من دەیبینم ئێوە نایبینن، (دیارە کە شەیتان بینیوویەتی چۆن فریشتە دەستە دەستە دادەبەزن بۆ یارمەتی ئیمانداران، بۆیە لە ترسا وتی): بێگومان من لە خوا دەترسم، خوایش زۆر سەخت و بە زەبرە لە تۆڵەدا.

(٤٩) کاتێک دووڕووەکان و ئەوانەی لە دڵیاندا نەخۆشی (بێ ئیمانی) تیا جێگیر بوو (بە ئیماندارانیان) دەوت: ئا ئەوانە ئاینەکەیان لە خۆبایی کردوون (ئەگینا بەو ژمارە کەمەوە چۆن خۆیان دەگرن)، (خواش دەفەرموێت) ئەوەی پشت بەخوا ببەستێت، ئەوە بەراستی خوا باڵادەست و دانایە.

(٥٠) ئەگەر دەتبینی کاتێک فریشتەکان گیانی ئەوانەیان دەکێشا کە بێباوەڕ بوون! کە دەیانکێشا بەدەم و چاو و پشتیاندا و (ڕاپێچیان دەکردن بۆ دۆزەخ و، پێیان دەوتن): دە بچێژن سزایەکی سوتێنەر . . .

(٥١) (هەروەها پێیان دەوتن) ئەو لێدان و سزایە هەر بەهۆی ئەوەوەیە کە خۆتان بە دەستی خۆتان پێشتان خستووە و چونکە بەراستی خوا بەهیچ شێوەیەک ستەمکار نیە لە بەندەکانی.

(٥٢) کارو کردەوەی (خوانەناسان لە هەموو سەردەمێکدا) وەکو داب و نەریتی فیرعەون و ئەو کەسانە وایە کە لە (سەردەمە) پێشووەکاندا هاتوون پێش ئەمان، ئەوانە بڕوایان نەبوو بەئایەت و فەرمانەکانی خوا، جا خوایش خەشمی لێ گرتن و لەناوی بردن بەهۆی گوناهو تاوانیانەوە، بەراستی خوا بە تواناو بەزەبرە لە تۆڵەدا.

ذَٰلِكَ بِأَنَّ ٱللَّهَ لَمۡ يَكُ مُغَيِّرٗا نِّعۡمَةً أَنۡعَمَهَا عَلَىٰ قَوۡمٍ حَتَّىٰ يُغَيِّرُواْ مَا بِأَنفُسِهِمۡ وَأَنَّ ٱللَّهَ سَمِيعٌ عَلِيمٞ ﴿٥٣﴾ كَدَأۡبِ ءَالِ فِرۡعَوۡنَ وَٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِهِمۡۚ كَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِ رَبِّهِمۡ فَأَهۡلَكۡنَٰهُم بِذُنُوبِهِمۡ وَأَغۡرَقۡنَآ ءَالَ فِرۡعَوۡنَۚ وَكُلّٞ كَانُواْ ظَٰلِمِينَ ﴿٥٤﴾ إِنَّ شَرَّ ٱلدَّوَآبِّ عِندَ ٱللَّهِ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ فَهُمۡ لَا يُؤۡمِنُونَ ﴿٥٥﴾ ٱلَّذِينَ عَٰهَدتَّ مِنۡهُمۡ ثُمَّ يَنقُضُونَ عَهۡدَهُمۡ فِي كُلِّ مَرَّةٖ وَهُمۡ لَا يَتَّقُونَ ﴿٥٦﴾ فَإِمَّا تَثۡقَفَنَّهُمۡ فِي ٱلۡحَرۡبِ فَشَرِّدۡ بِهِم مَّنۡ خَلۡفَهُمۡ لَعَلَّهُمۡ يَذَّكَّرُونَ ﴿٥٧﴾ وَإِمَّا تَخَافَنَّ مِن قَوۡمٍ خِيَانَةٗ فَٱنۢبِذۡ إِلَيۡهِمۡ عَلَىٰ سَوَآءٍۚ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ ٱلۡخَآئِنِينَ ﴿٥٨﴾ وَلَا يَحۡسَبَنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ سَبَقُوٓاْۚ إِنَّهُمۡ لَا يُعۡجِزُونَ ﴿٥٩﴾ وَأَعِدُّواْ لَهُم مَّا ٱسۡتَطَعۡتُم مِّن قُوَّةٖ وَمِن رِّبَاطِ ٱلۡخَيۡلِ تُرۡهِبُونَ بِهِۦ عَدُوَّ ٱللَّهِ وَعَدُوَّكُمۡ وَءَاخَرِينَ مِن دُونِهِمۡ لَا تَعۡلَمُونَهُمُ ٱللَّهُ يَعۡلَمُهُمۡۚ وَمَا تُنفِقُواْ مِن شَيۡءٖ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ يُوَفَّ إِلَيۡكُمۡ وَأَنتُمۡ لَا تُظۡلَمُونَ ﴿٦٠﴾ ۞ وَإِن جَنَحُواْ لِلسَّلۡمِ فَٱجۡنَحۡ لَهَا وَتَوَكَّلۡ عَلَى ٱللَّهِۚ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلۡعَلِيمُ ﴿٦١﴾



(٥٣) ئەو سزاو لەناو بردنە لەبەر ئەوەیە کە (بڕیاری خوا وایە) بێگومان خوا هیچ نازو نیعمەتێکی نەگۆڕیوە کە بەخشیبێتی بەهەر قەوم و گەلێک، هەتا ئەوان ئەوەی بەخۆیان دەکرێت نەیگۆڕن و نەیکەن، چونکە بەڕاستیش خوای گەورە بیسەری(گوفتارەکانە) زانایە بەکردارەکان.

(٥٤) (ڕەوشتی ئەمانە) هەر وەکو داب و نەریتی دارو دەستەی فیرعەون و ئەوانەی پێشیان وایە، کە بەڵگەو فەرمانەکانی پەروەردگاریان بەدرۆ دەزانی و باوەڕیان پێی نەبوو، لە ئەنجامدا ئێمەش بەهۆی گوناهو تاوانیانەوە لەناومان بردن و دارو دەستەی فیرعەونیشمان نوقمی دەریا کرد، هەمووشیان ستەمکار بوون.

(٥٥) بەڕاستی خراپترینی زیندەوەران لای خوا ئەوانەن کە بێ باوەڕ بوون، چونکە ئەوان باوەڕ ناهێنن...

(٥٦) ئەوانەی کە پەیمانت لەگەڵدا بەستن (کە خیانەتت لێ نەکەن) کەچی پاشان لە هەموو جارێکدا هەر پەیمانەکەیان دەشکاند و ئەوان لە خوا ناترسن و پارێزکاری ناکەن.

(٥٧) جا هەرکاتێک ڕووبەڕووی (خوانەناسان) بویتەوە لە جەنگدا، ئەوە وایان لێ بکە ئەوانەی لە دوایانەوەن و یارمەتیان دەدەن پەرش و بڵاو ببن، بەو هیوایەی ئەوان پەندو عیبرەت و ئامۆژگاریی وەربگرن.

(٥٨) خۆ ئەگەر بێگومان ترسایت لە دەستەیەک (کە پەیمانت لەگەڵدا بەستوون) پەیمانەکە هەڵوەشێننەوەو خیانەتت لێ بکەن ئەوە تۆیش لەم کاتەدا پەیمانەکە بدەرەوە بەڕوویاندا بەشێوەیەکی ڕێک و ڕاست، (پێیان بڵێ کە) پەیمانەکەیان نرخی نەماوە، چونکە بەڕاستی خوا کەسانی پەیمان شکێن و ناپاکی خۆش ناوێت.

(٥٩) با ئەوانەی کە بێبڕوا بوون وا نەزانن کە لە دەستمان دەرچوون، بەڕاستی ئەوانە ناتوانن دەسەوسانمان بکەن و لە دەستمان دەرناچن.

(٦٠) (خوا فەرمان دەدات بەکار بەدەستانی دەوڵەتی ئیسلام): هەرچی لە تواناتاندا هەیە بۆ بەهێزکردنی سوپای ئیسلام بیخەنە گەڕو ئامادەیی بکەن (هێزی ئاسمانی و دەریایی و وشکانی...هتد) و لە ئامادەکردنی هەموو جۆرە ئەسپ و (هۆکانی تری گواستنەوە) کەمتەرخەمی مەکەن تا دوژمنانی خواو دوژمنانی خۆتانی پێ چاوترسێن بکەن، با کەسانی تریش جگە لەم دوژمنانەی ئێستا، پێی چاوترسێن ببن کە ئێستە ئێوە نازانن کێن و نایانناسن، بەڵکو هەر خوا خۆی دەیانناسێت و هەر شتێک ببەخشن لە پێناوی خوادا (بۆ بەهێز کردنی سوپای ئیسلام)، ئەوە بەزایە ناچێت و دەستان دەکەوێتەوەو ئێوە ستەمتان لێناکرێت.

(٦١) جا ئەگەر (دوژمنان) بەلای ئاشتیدا دایانشکاند و حەزیان پێکرد تۆش (ئەی محمد ﷺ، ئەی پێشەوا) ئامادەیی خۆت دەربڕە و پشت بەخوا ببەستە چونکە بەڕاستی ئەو زاتە بیسەرو زانایە (لە پیلان و نەخشەی دوژمنان ئاگادارە).

وَإِن يُرِيدُوٓاْ أَن يَخْدَعُوكَ فَإِنَّ حَسْبَكَ ٱللَّهُ ۚ هُوَ ٱلَّذِىٓ أَيَّدَكَ بِنَصْرِهِۦ وَبِٱلْمُؤْمِنِينَ ﴿٦٢﴾ وَأَلَّفَ بَيْنَ قُلُوبِهِمْ ۚ لَوْ أَنفَقْتَ مَا فِى ٱلْأَرْضِ جَمِيعًا مَّآ أَلَّفْتَ بَيْنَ قُلُوبِهِمْ وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ أَلَّفَ بَيْنَهُمْ ۚ إِنَّهُۥ عَزِيزٌ حَكِيمٌ ﴿٦٣﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِىُّ حَسْبُكَ ٱللَّهُ وَمَنِ ٱتَّبَعَكَ مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴿٦٤﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِىُّ حَرِّضِ ٱلْمُؤْمِنِينَ عَلَى ٱلْقِتَالِ ۚ إِن يَكُن مِّنكُمْ عِشْرُونَ صَٰبِرُونَ يَغْلِبُواْ مِاْئَتَيْنِ ۚ وَإِن يَكُن مِّنكُم مِّاْئَةٌ يَغْلِبُوٓاْ أَلْفًا مِّنَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ بِأَنَّهُمْ قَوْمٌ لَّا يَفْقَهُونَ ﴿٦٥﴾ ٱلْـَٰٔنَ خَفَّفَ ٱللَّهُ عَنكُمْ وَعَلِمَ أَنَّ فِيكُمْ ضَعْفًا ۚ فَإِن يَكُن مِّنكُم مِّاْئَةٌ صَابِرَةٌ يَغْلِبُواْ مِاْئَتَيْنِ ۚ وَإِن يَكُن مِّنكُمْ أَلْفٌ يَغْلِبُوٓاْ أَلْفَيْنِ بِإِذْنِ ٱللَّهِ ۗ وَٱللَّهُ مَعَ ٱلصَّٰبِرِينَ ﴿٦٦﴾ مَا كَانَ لِنَبِىٍّ أَن يَكُونَ لَهُۥٓ أَسْرَىٰ حَتَّىٰ يُثْخِنَ فِى ٱلْأَرْضِ ۚ تُرِيدُونَ عَرَضَ ٱلدُّنْيَا وَٱللَّهُ يُرِيدُ ٱلْءَاخِرَةَ ۗ وَٱللَّهُ عَزِيزٌ حَكِيمٌ ﴿٦٧﴾ لَّوْلَا كِتَٰبٌ مِّنَ ٱللَّهِ سَبَقَ لَمَسَّكُمْ فِيمَآ أَخَذْتُمْ عَذَابٌ عَظِيمٌ ﴿٦٨﴾ فَكُلُواْ مِمَّا غَنِمْتُمْ حَلَٰلًا طَيِّبًا ۚ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿٦٩﴾

(٦٢) خۆ ئەگەر خوانەناسان (بە داخوازی ڕێکەوتن و ئاشتی) ویستیان بتخەڵەتێنن، ئەوە دڵنیابە کە پشتیوانیی خوا بەسە (کە نەیەڵێت بکەویتە ناو پیلان و نەخشەیانەوە) چونکە هەر ئەو زاتە کاتی خۆی پشتیوانیی لێکردیت و سەری خستیت و ئیماندارانیشی کردە هۆیەک بۆ بەدەستهێنانی سەرکەوتن...

(٦٣) دڵەکانیشیانی بەست بەیەکەوە، ئەگەر هەرچی دارایی زەوی هەیە، هەر هەموویت خەرج بکردایە تا دڵەکانیانت پەیوەند بکردایە بە یەکەوە، ئەوە نەتدەتوانی ئەو دڵانە پەیوەست بکەیت بەیەکەوە، بەڵام خوا (بەهۆی ئاینی ئیسلامەوە) خۆشی و یەکێتی و برایەتی لە نێوانیاندا بەرپاکرد، چونکە بەڕاستی ئەو زاتە باڵادەست و دانایە.

(٦٤) ئەی پێغەمبەرﷺ: تەنها خوا بەسە بۆ خۆت و ئەوانەی شوێنت کەوتوون لە ئیمانداران کە پشتگیر و یاریدەدەرتان بێت.

(٦٥) ئەی پێغەمبەرﷺ: هانی ئیمانداران بدە لەسەر جەنگ (دژی ئەوانەی کە کۆسپن لە ڕێبازی گەیاندنی پەیامی خودا) ئەگەر بیست کەسی خۆڕاگر هەبێت لە ئێوە، ئەوە زاڵ دەبن بەسەر دووسەد کەسدا، خۆ ئەگەر سەد کەس لە ئێوە هەبن، ئەوە بەسەر هەزار کەس لەوانەی کە بێ باوەڕن زاڵ دەبن، چونکە بەڕاستی ئەوانە کەسانێکن کە تێناگەن (چ هێزێک پشتیوانیی لە ئێوە دەکات).

(٦٦) (ئەی ئیمانداران): ئێستە ئیتر خوا ئەرکی لەسەر کەمکردنەوە و دەیزانی کە لاوازیتان تێدایە (لە ڕووی مادی و مەعنەویەوە، لەبەرئەوە): جا ئەگەر سەدکەسی خۆڕاگر هەبێت لە ئێوە، ئەوە زاڵ دەبن بەسەر دووسەد کەسداو ئەگەر هەزار کەستان هەبێت، ئەوە زاڵ دەبن بەسەر دوو هەزاردا، ئەویش بەویست و یارمەتی خوا، خوایش یارو یاوەری خۆڕاگرانە.

(٦٧) بۆ هیچ پێغەمبەرێک نەبووە کە دیلی هەبێت، هەتا کاتێک چاک پایەدارو جێگیر دەبێت لە زەویدا، (مەگەر) کەلوپەل و شتومەکی دنیاتان دەوێت؟! لەکاتێکدا خوا (سەرفرازیی) ئەو جیهانی دەوێت و قیامەتی مەبەستە و خوا باڵادەست و دانایە (سەرکەوتن بەئیمانداران دەبەخشێت و دانایە لە تاقی کردنەوەیاندا).

(٦٨) خۆ ئەگەر بڕیارێک لەلایەن خواوە پێش نەکەوتایە (کە مرۆڤ هەتا پەیامی خوای پێنەگات خوا سزای نادات) لەسەر ئەو شتانەی کە وەرتان گرت (لە بەرامبەر ئازادکردنی دیلەکانەوە) ئەوە سزایەکی زۆر گەورەتان تووش دەبوو.

(٦٩) کەوابوو بخۆن لەو شتانەی کە دەستتان کەوتووە، بەحەڵاڵێکی چاک و پاک، لە خوا بترسن و دینداربن، چونکە بەڕاستی ئەو خوایە لێخۆشبوو میهرەبانە.

يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ قُل لِّمَن فِيٓ أَيۡدِيكُم مِّنَ ٱلۡأَسۡرَىٰٓ إِن يَعۡلَمِ ٱللَّهُ فِي قُلُوبِكُمۡ خَيۡرٗا يُؤۡتِكُمۡ خَيۡرٗا مِّمَّآ أُخِذَ مِنكُمۡ وَيَغۡفِرۡ لَكُمۡۚ وَٱللَّهُ غَفُورٞ رَّحِيمٞ ﴿٧٠﴾ وَإِن يُرِيدُواْ خِيَانَتَكَ فَقَدۡ خَانُواْ ٱللَّهَ مِن قَبۡلُ فَأَمۡكَنَ مِنۡهُمۡۗ وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ ﴿٧١﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَهَاجَرُواْ وَجَٰهَدُواْ بِأَمۡوَٰلِهِمۡ وَأَنفُسِهِمۡ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ وَٱلَّذِينَ ءَاوَواْ وَّنَصَرُوٓاْ أُوْلَٰٓئِكَ بَعۡضُهُمۡ أَوۡلِيَآءُ بَعۡضٖۚ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَلَمۡ يُهَاجِرُواْ مَا لَكُم مِّن وَلَٰيَتِهِم مِّن شَيۡءٍ حَتَّىٰ يُهَاجِرُواْۚ وَإِنِ ٱسۡتَنصَرُوكُمۡ فِي ٱلدِّينِ فَعَلَيۡكُمُ ٱلنَّصۡرُ إِلَّا عَلَىٰ قَوۡمِۭ بَيۡنَكُمۡ وَبَيۡنَهُم مِّيثَٰقٞۗ وَٱللَّهُ بِمَا تَعۡمَلُونَ بَصِيرٞ ﴿٧٢﴾ وَٱلَّذِينَ كَفَرُواْ بَعۡضُهُمۡ أَوۡلِيَآءُ بَعۡضٍۚ إِلَّا تَفۡعَلُوهُ تَكُن فِتۡنَةٞ فِي ٱلۡأَرۡضِ وَفَسَادٞ كَبِيرٞ ﴿٧٣﴾ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَهَاجَرُواْ وَجَٰهَدُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ وَٱلَّذِينَ ءَاوَواْ وَّنَصَرُوٓاْ أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡمُؤۡمِنُونَ حَقّٗاۚ لَّهُم مَّغۡفِرَةٞ وَرِزۡقٞ كَرِيمٞ ﴿٧٤﴾ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مِنۢ بَعۡدُ وَهَاجَرُواْ وَجَٰهَدُواْ مَعَكُمۡ فَأُوْلَٰٓئِكَ مِنكُمۡۚ وَأُوْلُواْ ٱلۡأَرۡحَامِ بَعۡضُهُمۡ أَوۡلَىٰ بِبَعۡضٖ فِي كِتَٰبِ ٱللَّهِۚ إِنَّ ٱللَّهَ بِكُلِّ شَيۡءٍ عَلِيمُۢ ﴿٧٥﴾

(٧٠) ئەی پێغەمبەرﷺ: بەو دیلانە بڵێ کە لەبەر دەستاندان، ئەگەر خـوا خێر لـە دڵـەکانتاندا بـەدی بکات، ئەوە زۆر لەوە باشترتان پێ دەبەخشێت کە لێتان وەرگیراوە، (ئەگەر باوەڕ بهێنن) لێتان خۆش دەبێت، خوایش لێخۆشبوو میهرەبانە.

(٧١) خۆ ئەگەر بیانەوێت خیانـەت و پیلان دژ بە تۆ (ئـەی پێغەمبـەرﷺ) بگێڕن، ئـەوە بەراستی ئەوانە پێشتر خیانەتیان لە خوا کردووە (بەوەی کـە شـەریکێ و هاوەڵیـان بـۆ بڕیـارداوە)، ئینجـا خـوا دەسەڵاتی لێسەندن و ئێـوەی زاڵ کـرد بەسـەریاندا، بێگومان خـوا زانایـە (بـە پیلانیـان) و دانایـە (بـە چۆنیەتی سنوور دانان بۆیان).

(٧٢) بەڕاستی ئەوانـەی کـە باوەڕیـان هێنـاوە و کۆچیان کردووەو تێکۆشاون لە پێناوی ئاینی خـوادا بـە خۆیـان و مـاڵ و سـامانیانەوە، ئەوانـەش کـە پێشوازیان لەکۆچبەران کردو لەماڵ و حاڵی خۆیـاندا جێیـان کردنـەوە و پشـتگیریان کـردن، ئـا ئەوانـە هەندێکیان پشتیوانی هەندێکی تریانن، ئەوانەش کە باوەڕیان هێناوەو کۆچیان نەکردووە، ئەوە بۆتان نیە پشـتگیریان بکـەن لـەهیچ شـتێکدا هـەتا ئـەوانیش کۆچ دەکەن (بۆ بەهێزکردنی دەوڵەتی ئیسلام)، خۆ ئەگەر ئـەو ئیماندارانـەی (کـە کۆچیـان نـەکردووە) داوای یارمـەتی و پشـتگیریان لـە ئێـوە کـرد بـۆ سەرخستنی ئاینی ئیسلام، ئەوە پێویستە لەسەرتان پشتگیریان بکەن، جگە لەسەر ئەو عەشرەت و لایەنەی کەلە نێوان ئێوە و ئەواندا پەیمانێکێ هەبێت (ئەو پەیمانە مەشکێنن)، خوای گەورەش بینایە بەو کارو کردەوانەی کە دەیکەن.

(٧٣) ئەوانەش کە بێباوەڕ بوون، هەندێکیان پشتیوانی هەندێکی تریانن و پشتیوانی لە یـەکتر دەکـەن، خۆ ئەگـەر ئێـوەی ئیماندار کۆمەکێ بەیەکتر نەکەن و پشتـی یەکتر نەگرن ئەوە لەسەر زەویدا ناخۆشی و ناکۆکی و گوناهو تاوانی گـەورە پێش دێت (ئازار و ناخۆشی بۆ ئێوەی ئیماندار پێش دێت).

(٧٤) ئەوانەش باوەڕیان هێناوە و کۆچیان کردوە و تێکۆشاون لە پێناوی خوادا، ئەوانـەش جێگـەی کۆچبـەرانیان کـردەوە و (پێشـوازیان کـردن) و یارمـەتیان دان، هـەر ئـا ئەوانـە بڕوادارانـی راستـەقینەن، (لـە بەهەشـتی بـەریندا) بۆیـان ئامادەیـە لێخۆشبوون و رزق و رۆزی بەپێزو پڕ بەرەکەت و جوان و رازاوە.

(٧٥) ئەوانەش کە باوەڕیان هێناوە لە دوای کـۆچ کردنـی یەکـەم و کۆچیـان کـردو هـەوڵ و کۆششـیاندا (لـە پێنـاوی گەیاندنی بەرنامـەی خوا) لەگەڵ ئێـوەدا، ئـا ئەوانـەش لـە ئێـوەن (پلـەی ئێوەیـان هەیـە)، ئەوانـەش کـە (سـەرەڕای پەیوەندی ئیمانی) پەیوەندی خزمایەتیشیان هەیە، هەندێکیان شایستەترن بەهەندێکی تریانـەوە لـە بەرنامـەی خـوادا (واتە ئەوان شایستەترن لە میرات بەریدا بۆ یەکتری)، بەڕاستی خوا بە هەموو شتێکێ زاناو ئاگایە.

سوورەتی (التـــوبة)

(١) ئەمە بەری بوونێکی گەورە و گرنگـە لەلایـەن خواو پێغەمبەرەکەیەوە بۆ ئەوانـەی کـە پـەیمانتان لەگەڵدا بەستبوون لـە هاوەڵگەران( واتـە پسـان و نەمانی ئەو پەیمانانەیـە کـە لەگـەڵ هاوەڵگـەراندا بەستراوە، چونکە ئەوان دەسـت پێشـخەر بـوون لـە شکاندنی پەیمانەکەدا).

(٢) جا کەواتە ئەی هاوەڵگەران بۆتان هەیـە چوار مـانگ بەسـەر زەویدا بگـەڕێن (تـا شـوێنێک بـۆ نیشتەجێ بوونـی خۆتـان دەدۆزنـەوە)، بشـزانن بەراستی ئێوە دەسەوسانکەری خوا نین و لە دەست ئەو دەرناچن، بەراستیش خوای گـەورە ریسـواکەری بێباوەڕانە.

(٣) ئەمەش بانگەوازو راگەیاندنێکە لەلایەن خواو پێغەمبەرەکەیـەوە بـۆ هـەموو خـەڵکی، لـە رۆژی حەجی گەورەدا کە: بەراستی خواو پێغەمبەرەکـەی بەرین لە موشریک و هاوەڵگەران، جا ئەگـەر ئێـوە تەوبە بکەن و بگەڕێنەوە لە بێباوەڕی ئەوە چاکترە بۆتان، خۆ ئەگەر هەر یـاخی بـن و پشت هەڵکـەن، ئەوە چاک بزانن بەراستی ئێوە دەسەوسانکەری خوا نین و لە دەسەڵاتی دەرناچن و مـژدە بـدە بەوانـەی کە بێباوەڕ بوون، بەسزایەکی پڕ ئێش و ئازار!!...

بِسْمِ سُورَةُ التَّوْبَةِ

بَرَآءَةٌ مِّنَ ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦٓ إِلَى ٱلَّذِينَ عَٰهَدتُّم مِّنَ ٱلْمُشْرِكِينَ ﴿١﴾ فَسِيحُوا۟ فِى ٱلْأَرْضِ أَرْبَعَةَ أَشْهُرٍ وَٱعْلَمُوٓا۟ أَنَّكُمْ غَيْرُ مُعْجِزِى ٱللَّهِ ۙ وَأَنَّ ٱللَّهَ مُخْزِى ٱلْكَٰفِرِينَ ﴿٢﴾ وَأَذَٰنٌ مِّنَ ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦٓ إِلَى ٱلنَّاسِ يَوْمَ ٱلْحَجِّ ٱلْأَكْبَرِ أَنَّ ٱللَّهَ بَرِىٓءٌ مِّنَ ٱلْمُشْرِكِينَ ۙ وَرَسُولُهُۥ ۚ فَإِن تُبْتُمْ فَهُوَ خَيْرٌ لَّكُمْ ۖ وَإِن تَوَلَّيْتُمْ فَٱعْلَمُوٓا۟ أَنَّكُمْ غَيْرُ مُعْجِزِى ٱللَّهِ ۗ وَبَشِّرِ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ بِعَذَابٍ أَلِيمٍ ﴿٣﴾ إِلَّا ٱلَّذِينَ عَٰهَدتُّم مِّنَ ٱلْمُشْرِكِينَ ثُمَّ لَمْ يَنقُصُوكُمْ شَيْـًٔا وَلَمْ يُظَٰهِرُوا۟ عَلَيْكُمْ أَحَدًا فَأَتِمُّوٓا۟ إِلَيْهِمْ عَهْدَهُمْ إِلَىٰ مُدَّتِهِمْ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلْمُتَّقِينَ ﴿٤﴾ فَإِذَا ٱنسَلَخَ ٱلْأَشْهُرُ ٱلْحُرُمُ فَٱقْتُلُوا۟ ٱلْمُشْرِكِينَ حَيْثُ وَجَدتُّمُوهُمْ وَخُذُوهُمْ وَٱحْصُرُوهُمْ وَٱقْعُدُوا۟ لَهُمْ كُلَّ مَرْصَدٍ ۚ فَإِن تَابُوا۟ وَأَقَامُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتَوُا۟ ٱلزَّكَوٰةَ فَخَلُّوا۟ سَبِيلَهُمْ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿٥﴾ وَإِنْ أَحَدٌ مِّنَ ٱلْمُشْرِكِينَ ٱسْتَجَارَكَ فَأَجِرْهُ حَتَّىٰ يَسْمَعَ كَلَٰمَ ٱللَّهِ ثُمَّ أَبْلِغْهُ مَأْمَنَهُۥ ۚ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ قَوْمٌ لَّا يَعْلَمُونَ ﴿٦﴾



(٤) بەڵام ئـەو هاوەڵگـەرانەی کـە پـەیمانتان لەگـەڵیاندا بەسـتووە، پاشـان پابـەندی پەیمانەکـە بـوون و هیچیـان لـێ کـەم نەکردووە و یارمەتی کەسیشیان نەداوە دژتان، ئەوە ئێـوە پەیمانەکـەیان بـۆ بەرنـە سـەرو تـەواوی بکـەن، تـا کـاتی دیـاری کراویان، چونکە بەراستی خوا پارێزکارانی خۆش دەوێت.

(٥) جا کاتێک مانگە حەرامەکان بەسەرچوون (کە بریتیە لە:ذوالقعدة، ذوالحجة، محرم، رجـب) ئـەوە هاوەڵگـەرانی پـەیمان شکێن بکوژن لەهەرکوێ دەستان لێیان گیر بوو، یـاخود بـەدیل بیـانگرن، سنوور دانێـن بـۆ چالاکیـان، هـەروەها کـەمین و بۆسەیان لە هەموو شوێنێکی لەباردا بۆ دانێن، جا ئەگەر (پێش ئەوەی دەستی ئێوەیان بگاتێ) تەوبەیان کردو وازیـان هێنـا لەو کارەیان و نوێژیان کردو زەکاتیاندا، ئەوە وازیان لێبهێنن و رێیان بۆ چۆڵ بکەن، چونکە بەراستی خوا لێخۆشبوو دلۆڤانـە (ئەگەر راست بکەن، خۆ ئەگەر بە راستیشتان نەبێت ئێوە هەر حسابی رواڵەت بکەن).

(٦) خۆ ئەگەر کەسێک لە هاوەڵگەران داوای پەنای لێ کردیت (ئەی پێغەمبەر ﷺ، ئەی ئیماندار)، ئەوە تۆیش پەنای بدە هەتا گوێی لە فەرموودەکەی خوا (قورئان) دەبێت، پاشان بیگەیەنە بەو شوێنەی دەیەوێت و (مـاڵ و گیـان و ژیـانی) تیـایدا پارێزراوە، ئەم میهرەبانیە لەبەر ئەوەیە ئەوانە کەسانێکن نازانن (خواناسی چیە).

كَيْفَ يَكُونُ لِلْمُشْرِكِينَ عَهْدٌ عِندَ ٱللَّهِ وَعِندَ رَسُولِهِۦٓ إِلَّا ٱلَّذِينَ عَٰهَدتُّمْ عِندَ ٱلْمَسْجِدِ ٱلْحَرَامِ ۖ فَمَا ٱسْتَقَٰمُوا۟ لَكُمْ فَٱسْتَقِيمُوا۟ لَهُمْ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلْمُتَّقِينَ ﴿٧﴾ كَيْفَ وَإِن يَظْهَرُوا۟ عَلَيْكُمْ لَا يَرْقُبُوا۟ فِيكُمْ إِلًّا وَلَا ذِمَّةً ۚ يُرْضُونَكُم بِأَفْوَٰهِهِمْ وَتَأْبَىٰ قُلُوبُهُمْ وَأَكْثَرُهُمْ فَٰسِقُونَ ﴿٨﴾ ٱشْتَرَوْا۟ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ ثَمَنًا قَلِيلًا فَصَدُّوا۟ عَن سَبِيلِهِۦٓ ۚ إِنَّهُمْ سَآءَ مَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴿٩﴾ لَا يَرْقُبُونَ فِى مُؤْمِنٍ إِلًّا وَلَا ذِمَّةً ۚ وَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُعْتَدُونَ ﴿١٠﴾ فَإِن تَابُوا۟ وَأَقَامُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتَوُا۟ ٱلزَّكَوٰةَ فَإِخْوَٰنُكُمْ فِى ٱلدِّينِ ۗ وَنُفَصِّلُ ٱلْـَٔايَٰتِ لِقَوْمٍ يَعْلَمُونَ ﴿١١﴾ وَإِن نَّكَثُوٓا۟ أَيْمَٰنَهُم مِّنۢ بَعْدِ عَهْدِهِمْ وَطَعَنُوا۟ فِى دِينِكُمْ فَقَٰتِلُوٓا۟ أَئِمَّةَ ٱلْكُفْرِ ۙ إِنَّهُمْ لَآ أَيْمَٰنَ لَهُمْ لَعَلَّهُمْ يَنتَهُونَ ﴿١٢﴾ أَلَا تُقَٰتِلُونَ قَوْمًا نَّكَثُوٓا۟ أَيْمَٰنَهُمْ وَهَمُّوا۟ بِإِخْرَاجِ ٱلرَّسُولِ وَهُم بَدَءُوكُمْ أَوَّلَ مَرَّةٍ ۚ أَتَخْشَوْنَهُمْ ۚ فَٱللَّهُ أَحَقُّ أَن تَخْشَوْهُ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ ﴿١٣﴾

(٧) چۆن پەیمان دەبێت بۆ هاوەڵگەران (ئەوانەی کە چەندەها جار پەیمان دەشکێنن)، لای خواو لای پێغەمبەرەکەی (پەیمان نابێت)؟! جگە لەوانەی کە لە پاڵ مزگەوتی حەرام و (کەعبەدا) پەیمانتان (لەگەڵیاندا مۆرکرد) هەتا ئەوان پابەند و راست و دروست بن لەسەر پەیمانەکەیان بەرامبەر ئێوەوە، ئەوە ئێوەش پابەندو راست و رەوان بن بۆیان، چونکە بەڕاستی خوا پارێزکارانی خۆش دەوێت.

(٨) چۆن (پابەندی پەیمان دەبن لەگەڵ ئێوەدا، کاری چاك لەوانە ناوەشێتەوە)خۆ ئەگەر لە کاتێکدا دەستیان بەسەرتاندا بڕوات ئەوە هیچ سنوورێك ناپارێزن، نەخزمایەتی دەفامن، نەپەیمان، بەدەم و زاریان رازیتان دەکەن، دڵەکانیشیان دژو بێزارن لەوەی کە بەدەم دەیڵێن (دژی راگرتنی پەیمانەکەیانن) زۆربەشیان لە سنوور دەرچوون و پەیمان شکێنن.

(٩) (هاوەڵگەران نرخیان بۆ ئایەتەکانی خوای گەورە دانەناوە) ئەوانە بە ئایەتەکانی خوا پارەو دەستمایەیەکی کەمی دنیایان کڕی و گۆڕیانەوە (ئایەتەکانی خوایان گۆڕیەوە بەنرخێکی کەم و هەرزان)و ئینجا پشتیان هەڵکرد لە رێگەی خوا، رێگری خەڵکیشیان لێ دەکرد، بەڕاستی ئەو (خوا نەناسانە) ناپەسەند بوو ئەو کارو کردەوەیەی کە دەیانکردو ئەنجامیان دەدا.

(١٠) ئەوانە دەربارەی هیچ ئیماندارێك سنووری خزمایەتی و پەیمان رەچاو ناکەن و ناپارێزن، هەر ئا ئەوانەشن دەستدرێژکاران.

(١١) جا ئەگەر تەوبە بکەن و پەشیمانی دەربڕن و نوێژەکانیان ئەنجام بدەن و زەکات لە ماڵ و سامانیان دەرکەن، ئەوە برای دینی ئێوەن، ئێمەیش ئایەت و فەرمانەکان روون دەکەینەوە بۆ کەسانێك کە دەیزانن.

(١٢) خۆ ئەگەر ئەوانە پەیمانەکانیان بشکێنن لەدوای بەستنی و گاڵتەو تانەوتەشەریان لە ئاین و بەرنامەکەتان دەدا، ئەوە بجەنگن دژی سەرانی کوفر، بەڕاستی ئەوان هیچ پەیمانێکیان نیە، بۆ ئەوەی کۆڵ بدەن و واز لە بێباوەڕی خۆیان بهێنن.

(١٣) باشە، ئایا ئێوە ناجەنگن دژی کەسانێك کە بەڵێن و پەیمانەکانیان هەڵوەشاندوە و هەوڵیشیاندا کە پێغەمبەر ﷺ دەرکەن لە شاری (مەککە) و هەر ئەوانیش یەکەمجار دەستیان کرد بە دژایەتیتان، ئایا لەوان دەترسن؟ جا خۆ هەر خوا شایستەیە کە لێی بترسن ئەگەر ئێوە ئیماندارن.

قَٰتِلُوهُمْ يُعَذِّبْهُمُ ٱللَّهُ بِأَيْدِيكُمْ وَيُخْزِهِمْ وَيَنصُرْكُمْ عَلَيْهِمْ وَيَشْفِ صُدُورَ قَوْمٍ مُّؤْمِنِينَ ﴿١٤﴾ وَيُذْهِبْ غَيْظَ قُلُوبِهِمْ ۗ وَيَتُوبُ ٱللَّهُ عَلَىٰ مَن يَشَآءُ ۗ وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ ﴿١٥﴾ أَمْ حَسِبْتُمْ أَن تُتْرَكُوا۟ وَلَمَّا يَعْلَمِ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ جَٰهَدُوا۟ مِنكُمْ وَلَمْ يَتَّخِذُوا۟ مِن دُونِ ٱللَّهِ وَلَا رَسُولِهِۦ وَلَا ٱلْمُؤْمِنِينَ وَلِيجَةً ۚ وَٱللَّهُ خَبِيرٌۢ بِمَا تَعْمَلُونَ ﴿١٦﴾ مَا كَانَ لِلْمُشْرِكِينَ أَن يَعْمُرُوا۟ مَسَٰجِدَ ٱللَّهِ شَٰهِدِينَ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِم بِٱلْكُفْرِ ۚ أُو۟لَٰٓئِكَ حَبِطَتْ أَعْمَٰلُهُمْ وَفِى ٱلنَّارِ هُمْ خَٰلِدُونَ ﴿١٧﴾ إِنَّمَا يَعْمُرُ مَسَٰجِدَ ٱللَّهِ مَنْ ءَامَنَ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْءَاخِرِ وَأَقَامَ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتَى ٱلزَّكَوٰةَ وَلَمْ يَخْشَ إِلَّا ٱللَّهَ ۖ فَعَسَىٰٓ أُو۟لَٰٓئِكَ أَن يَكُونُوا۟ مِنَ ٱلْمُهْتَدِينَ ﴿١٨﴾ ۞ أَجَعَلْتُمْ سِقَايَةَ ٱلْحَآجِّ وَعِمَارَةَ ٱلْمَسْجِدِ ٱلْحَرَامِ كَمَنْ ءَامَنَ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْءَاخِرِ وَجَٰهَدَ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ ۚ لَا يَسْتَوُۥنَ عِندَ ٱللَّهِ ۗ وَٱللَّهُ لَا يَهْدِى ٱلْقَوْمَ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿١٩﴾ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَهَاجَرُوا۟ وَجَٰهَدُوا۟ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ بِأَمْوَٰلِهِمْ وَأَنفُسِهِمْ أَعْظَمُ دَرَجَةً عِندَ ٱللَّهِ ۚ وَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْفَآئِزُونَ ﴿٢٠﴾



(١٤) (ئەی ئیمانداران) بجەنگن دژی بێ باوەڕان، ئەوە خوایە کە بەدەستی ئێوە سزایان دەدات و سەرشۆڕو خەجاڵەتیان دەکات و ئێوە بەسەریاندا سەر دەخات سینەی گرۆی ئیماندارانیش گوشادو ئاسوودە دەکات و دڵ و دەروونیان سارێژ دەکات (چونکە کاتی خۆی کافرەکانی مەککە زۆر ئازارو ئەشکەنجەی ئیماندارانیان دەداو بێ بەزەییانە هەندێکیان لێ شەهید کردن).

(١٥) هەرچی ئازارو کینەش هەیە لەدڵی ئیمانداراندا لای ببات و نەیهێڵێت، خوای گەورەش تەوبەو پەشیمانی لەو کەسە وەردەگرێت کە خۆی دەیەوێت و (شایستەیە)، خوای گەورە زاناو دانایە.

(١٦) (ئەی ئیمانداران) ئایا پێتان وابوو و واتان دەزانی هەروا وازتان لێدەهێنرێت (بێ تاقیکردنەوە) لەکاتێکدا هێشتا خوا دەری نەخستووە ئەوانەی جیهادیان کردووەو تێکۆشاون لە ئێوەو جگەلە خواو پێغەمبەرەکەی و ئیمانداران کەسانی تریان نەکردووە بەجێی متمانەو رازو نهێنی خۆیان، خوایش هەمیشە ئاگادارە بە هەموو ئەو کارو کردەوانەی کە ئەنجامی دەدەن (بەڵام دەیەوێت هەموو راستیەکان دەرکەون و بینەروو).

(١٧) شیاو وشایستە نەبووە بۆ موشریک و هاوەڵگەران کە مزگەوتەکانی خوا ئاوەدان بکەنەوە، لەکاتێکدا خۆیان شایەتن لەسەر خۆیان کە بێ‌باوەڕن، ئەوانە هەموو کارو کردەوەکانیان بێ نرخە و پووچەڵ بۆتەوە، ئەوان لەناو ئاگری دۆزەخدا (لە ژیانی کولە مەرگیدا) بەردەوامن.

(١٨) بەڕاستی تەنها ئەو کەسە (بەدڵ و بەگیان) مزگەوتەکانی خوا ئاوەدان دەکاتەوە (بە خواپەرستی و نوێکردنەوەی) کە باوەڕی پتەوی بەخواو بەڕۆژی دوایی هێناوە و نوێژەکانی بەچاکی ئەنجام داوەو زەکاتیشی (لە ماڵ وسامانی) دەرکردووە و لە کەسیش نەترساوە جگە لە خوای باڵادەست، جا ئومێدە ئەو جۆرە کەسانە لە ریزی رێنموویی کراواندا بن.

(١٩) ئایا ئێوە بەرەواو دروستتان دانا ئاوبەخشین بەحاجیان و ئاوەدان کردنەوەی مزگەوتی حەرام (کەعبە)، وەک ئەو کەسە وابێت کە باوەڕی پتەوی بە خواو بەڕۆژی دوایی هێناوەو تێکۆشاوە لە پێناوی رێبازی خوادا؟ ئەو دوو دەستەیە وەک یەکنین و لەیەک ئاستدا نین لای خوا، خوای گەورەش هیدایەت و رێنموویی قەومی ستەمکارنادات.

(٢٠) ئەوانەی باوەڕیان هێناوە و کۆچیان کردووە و جیهادو هەوڵ و کۆششیان ئەنجامداوە لە پێناوی رێبازو رەزامەندیی خوادا بە ماڵیان و بەگیانیان، پلەوپایەو پاداشتیان لای خوا بێ‌سنوور و گەورەترە، ئا ئەوانەش کە باسکران هەر ئەوانە سەرفرازو بەختەوەرن...

يُبَشِّرُهُمْ رَبُّهُم بِرَحْمَةٍ مِّنْهُ وَرِضْوَٰنٍ وَجَنَّٰتٍ لَّهُمْ فِيهَا نَعِيمٌ مُّقِيمٌ ﴿٢١﴾ خَٰلِدِينَ فِيهَآ أَبَدًا ۚ إِنَّ ٱللَّهَ عِندَهُۥٓ أَجْرٌ عَظِيمٌ ﴿٢٢﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَا تَتَّخِذُوٓا۟ ءَابَآءَكُمْ وَإِخْوَٰنَكُمْ أَوْلِيَآءَ إِنِ ٱسْتَحَبُّوا۟ ٱلْكُفْرَ عَلَى ٱلْإِيمَٰنِ ۚ وَمَن يَتَوَلَّهُم مِّنكُمْ فَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلظَّٰلِمُونَ ﴿٢٣﴾ قُلْ إِن كَانَ ءَابَآؤُكُمْ وَأَبْنَآؤُكُمْ وَإِخْوَٰنُكُمْ وَأَزْوَٰجُكُمْ وَعَشِيرَتُكُمْ وَأَمْوَٰلٌ ٱقْتَرَفْتُمُوهَا وَتِجَٰرَةٌ تَخْشَوْنَ كَسَادَهَا وَمَسَٰكِنُ تَرْضَوْنَهَآ أَحَبَّ إِلَيْكُم مِّنَ ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ وَجِهَادٍ فِى سَبِيلِهِۦ فَتَرَبَّصُوا۟ حَتَّىٰ يَأْتِىَ ٱللَّهُ بِأَمْرِهِۦ ۗ وَٱللَّهُ لَا يَهْدِى ٱلْقَوْمَ ٱلْفَٰسِقِينَ ﴿٢٤﴾ لَقَدْ نَصَرَكُمُ ٱللَّهُ فِى مَوَاطِنَ كَثِيرَةٍ ۙ وَيَوْمَ حُنَيْنٍ ۙ إِذْ أَعْجَبَتْكُمْ كَثْرَتُكُمْ فَلَمْ تُغْنِ عَنكُمْ شَيْـًٔا وَضَاقَتْ عَلَيْكُمُ ٱلْأَرْضُ بِمَا رَحُبَتْ ثُمَّ وَلَّيْتُم مُّدْبِرِينَ ﴿٢٥﴾ ثُمَّ أَنزَلَ ٱللَّهُ سَكِينَتَهُۥ عَلَىٰ رَسُولِهِۦ وَعَلَى ٱلْمُؤْمِنِينَ وَأَنزَلَ جُنُودًا لَّمْ تَرَوْهَا وَعَذَّبَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ ۚ وَذَٰلِكَ جَزَآءُ ٱلْكَٰفِرِينَ ﴿٢٦﴾

(٢١) (جا ئه‌وانه) په‌روه‌ردگاريان مژده يان ده‌داتێ به ره‌حمه‌ت و ميهره‌بانی تايبه‌تی له لايه‌ن خۆيه‌وه، هاورێ له‌گه‌ڵ ره‌زامه‌ندی و خۆشنوودی و به‌هه‌شت و باخی بێ شومار، له كاتێكدا بۆ ئه‌وان هه‌يه له‌و به‌هه‌شته‌دا نازو نيعمه‌تی نه‌براوه كه پێشكه‌شيان ده‌كرێت.

(٢٢) له‌هه‌مان كاتدا له‌و به‌هه‌شته‌دا بۆ هه‌ميشه و به‌رده‌وام ژيان ده‌به‌نه سه‌ر، به‌راستی خوای به‌خشنده پاداشتی گه‌وره و بێ سنووری له‌لايه.

(٢٣) ئه‌ی ئه‌و كه‌سانه‌ی باوه‌ڕتان هێناوه، باوو باپيران و براكانتان مه‌كه‌نه پشتيوان و خۆشه‌ويستی خۆتان، ئه‌گه‌ر ئه‌وان بێ باوه‌ڕيان خۆش ويست و هه‌ڵيانبژارد به‌سه‌ر ئيمان و باوه‌ڕدا، هه‌ركه‌س له ئێوه پشت به‌وان ببه‌ستێت و خۆشی بوێن، ئائه‌وانه هه‌ر سته‌مكارن.

(٢٤) (ئه‌ی محمد ﷺ پێيان بڵێ: ئه‌گه‌ر باوو باپيرتان و رۆڵه و نه‌وه‌كانتان و براكانتان و هاوسه‌رانتان و عه‌شره‌ت و هۆزتان و ماڵ و سامانێك كه به‌ده‌ستان هێناوه، ياخود بازرگانيه‌ك ده‌ترسن كه شكان و بێ بازاڕی رووی تێبكات و خانووبه‌ره و كۆشك و ته‌لارێك كه حه‌ز ده‌كه‌ن لێتان تێك نه‌چێت و دڵخۆشن پێی، لاتان خۆشه‌ويستترو نازدارتر بێت له خواو پێغه‌مبه‌ره‌كه‌ی و جيهادو تێكۆشان له‌پێناو رێبازی ئه‌و زاته‌دا، ده ئه‌وه چاوه‌ڕوان بن، هه‌تا خوای گه‌وره دێت به فه‌رمانه‌كانيه‌وه و (تۆڵه‌تان لێ ده‌سێنێت)، خوای په‌روه‌ردگاريش هيدايه‌ت و رێنموويی قه‌ومی ياخی و له سنوور ده‌رچوو نادات.

(٢٥) سوێند بێت بێگومان خوای گه‌وره له زۆر شوێندا سه‌ری خستن (به‌سه‌ر بێباوه‌ڕاندا)، له رۆژی حونه‌ينيش كاتێك كه زۆريی ژماره‌ی خۆتان سه‌رسامی كردبوون، جا (بينيتان) ئه‌و زۆريه هيچ فرياتان نه‌كه‌وت و بێ‌نيازی نه‌كردن، زه‌ويش چه‌نده فراوانه لێتان هاته‌وه يه‌ك و ته‌نگ بووه‌وه، له‌وه‌ودوا هه‌موو پشتان هه‌ڵكردو راتانكرد.

(٢٦) پاشان خوای گه‌وره ئارامی و ئاسووده‌يی دابه‌زانده سه‌ر پێغه‌مبه‌ره‌كه‌ی و سه‌ر ئيمانداران و سه‌ربازانێكی دابه‌زان كه نه‌تانديبووه، سزای ئه‌وانه‌شيدا كه بێباوه‌ڕان بوون، ئه‌وه‌ش سزای و پاداشتی بێباوه‌ڕانه.

ثُمَّ يَتُوبُ ٱللَّهُ مِنۢ بَعۡدِ ذَٰلِكَ عَلَىٰ مَن يَشَآءُۗ وَٱللَّهُ غَفُورٞ رَّحِيمٞ ﴿٢٧﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِنَّمَا ٱلۡمُشۡرِكُونَ نَجَسٞ فَلَا يَقۡرَبُواْ ٱلۡمَسۡجِدَ ٱلۡحَرَامَ بَعۡدَ عَامِهِمۡ هَٰذَاۚ وَإِنۡ خِفۡتُمۡ عَيۡلَةٗ فَسَوۡفَ يُغۡنِيكُمُ ٱللَّهُ مِن فَضۡلِهِۦٓ إِن شَآءَۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمٌ حَكِيمٞ ﴿٢٨﴾ قَٰتِلُواْ ٱلَّذِينَ لَا يُؤۡمِنُونَ بِٱللَّهِ وَلَا بِٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِ وَلَا يُحَرِّمُونَ مَا حَرَّمَ ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥ وَلَا يَدِينُونَ دِينَ ٱلۡحَقِّ مِنَ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡكِتَٰبَ حَتَّىٰ يُعۡطُواْ ٱلۡجِزۡيَةَ عَن يَدٖ وَهُمۡ صَٰغِرُونَ ﴿٢٩﴾ وَقَالَتِ ٱلۡيَهُودُ عُزَيۡرٌ ٱبۡنُ ٱللَّهِ وَقَالَتِ ٱلنَّصَٰرَى ٱلۡمَسِيحُ ٱبۡنُ ٱللَّهِۖ ذَٰلِكَ قَوۡلُهُم بِأَفۡوَٰهِهِمۡۖ يُضَٰهِـُٔونَ قَوۡلَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ مِن قَبۡلُۚ قَٰتَلَهُمُ ٱللَّهُۚ أَنَّىٰ يُؤۡفَكُونَ ﴿٣٠﴾ ٱتَّخَذُوٓاْ أَحۡبَارَهُمۡ وَرُهۡبَٰنَهُمۡ أَرۡبَابٗا مِّن دُونِ ٱللَّهِ وَٱلۡمَسِيحَ ٱبۡنَ مَرۡيَمَ وَمَآ أُمِرُوٓاْ إِلَّا لِيَعۡبُدُوٓاْ إِلَٰهٗا وَٰحِدٗاۖ لَّآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَۚ سُبۡحَٰنَهُۥ عَمَّا يُشۡرِكُونَ ﴿٣١﴾

(٢٧) ئینجا دوای ئـهوه خـوای گـهوره لـه هـهر كهسێكێ كـه بیـهوێت و شایسته بێت تهوبـه و پهشـیمانی وهردهگرێـت خــوا لێخۆشــبوو میهرهبانه.

(٢٨) ئهی ئهو كهسانهی باوهڕتان هێناوه چاك بزانـن كـه موشریكێ و هاوهڵگـهران نـاپوخت و پیسن، ئیتر لهم ساڵهیان بـهدواوه نـابێت نزیكی مزگهوتی حهرام (كهعبهی پـیرۆز) بكـهون، خۆ ئهگهر دهترسن له ههژاری و نهداری و بێ بـازاڕی ئهوه بزانن كهله ئایندهدا خوای گهوره له فهزڵ و بهخشندهیی خۆی دهوڵهمـهندتان دهكـات هـهر كـاتێك بیـهوێت (بێگومـان سـامانی نـهوت و كانزاكان بهشـێكن لـهو مژدهیه) بهڕاسـتی خوا زاناو دانایه.

(٢٩) (ئـهی ئیمـانداران) دژی ئهوانــهی كــه بـاوهڕی (ڕاسـت و دروسـتیان) بـهخواو بـهرۆژی قیامهت نیه و ئهو شتانهی خواو پێغهمبهرهكهی بهحهرامیان داناوه بهحهرامی نـازانن و پـهیڕهوی دینی حهق نابن، لهوانهی كه كتێبیان پێدراوه له (گاورو جوو) بجهنگن، ههتا ئهو كاتـهی بـهناچاری بـاج پێشـكهش بهدهوڵهتی ئیسلام دهكهن، (لهجیاتی ئهوهی كه گیان و ماڵ و سامانیان پارێزراوه و بهشداری جهنگ ناكهن).

(٣٠) جولهكه وتیان: عوزهیر كوڕی خوایه، گاورهكانیش وتیان: مهسیح كوڕی خوایه!! ئا ئـهو بوختانـه (نابهجێیانـه) قسهی ئهوانه و بهدهم دهیڵێن و لێی تێناگهن (بیرێك ناكهنهوه، تێافكرن) ئهو گوفتارهیان لاسایی كردنهوهی ئهوانهیـه كه پێشتر بێ باوهڕ بوون (لهوهدا كه دهیانوت فریشتهكان كچی خـوان)، دهك بهكوشت چـن و خـوا لـهناویان بـهرێت، ئاخر ئهم بوختانه ناڕهوایانه چۆن ههڵدهبهستن.

(٣١) (گـاورو جـوو) حاخـام و قهشـهكانی خۆیـان كردۆتـه پـهروهردگاری خۆیـان لـه جیـاتی خـوا (ملكـهچ و فهرمانبـهرداریانن، ئـهوانیش بـهئارهزووی خۆیـان شـتیان بـۆ حـهڵاڵ یـان حـهرام دهكـهن) هـهروهها مهسـیحی كـوڕی مهریهمیش (بهكوڕی خوا دهزانن) لهكاتێكدا كه فهرمانیان پێنهدراوه جگـه لـه پهرستنی تاكه خوایـهك، بێگومـان جگه لهوزاته خوایهكی تر نیه، پاكی و بێگهردی و ستایش بۆ ئهو زاتهیه، كه (ئهو نهفامانه) هاوهڵی بۆ بڕیار دهدهن.

يُرِيدُونَ أَن يُطْفِـُٔوا۟ نُورَ ٱللَّهِ بِأَفْوَٰهِهِمْ وَيَأْبَى ٱللَّهُ إِلَّآ أَن يُتِمَّ نُورَهُۥ وَلَوْ كَرِهَ ٱلْكَٰفِرُونَ ﴿٣٢﴾ هُوَ ٱلَّذِىٓ أَرْسَلَ رَسُولَهُۥ بِٱلْهُدَىٰ وَدِينِ ٱلْحَقِّ لِيُظْهِرَهُۥ عَلَى ٱلدِّينِ كُلِّهِۦ وَلَوْ كَرِهَ ٱلْمُشْرِكُونَ ﴿٣٣﴾ ۞ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ إِنَّ كَثِيرًا مِّنَ ٱلْأَحْبَارِ وَٱلرُّهْبَانِ لَيَأْكُلُونَ أَمْوَٰلَ ٱلنَّاسِ بِٱلْبَٰطِلِ وَيَصُدُّونَ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ ۗ وَٱلَّذِينَ يَكْنِزُونَ ٱلذَّهَبَ وَٱلْفِضَّةَ وَلَا يُنفِقُونَهَا فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ فَبَشِّرْهُم بِعَذَابٍ أَلِيمٍ ﴿٣٤﴾ يَوْمَ يُحْمَىٰ عَلَيْهَا فِى نَارِ جَهَنَّمَ فَتُكْوَىٰ بِهَا جِبَاهُهُمْ وَجُنُوبُهُمْ وَظُهُورُهُمْ ۖ هَٰذَا مَا كَنَزْتُمْ لِأَنفُسِكُمْ فَذُوقُوا۟ مَا كُنتُمْ تَكْنِزُونَ ﴿٣٥﴾ إِنَّ عِدَّةَ ٱلشُّهُورِ عِندَ ٱللَّهِ ٱثْنَا عَشَرَ شَهْرًا فِى كِتَٰبِ ٱللَّهِ يَوْمَ خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ مِنْهَآ أَرْبَعَةٌ حُرُمٌ ۚ ذَٰلِكَ ٱلدِّينُ ٱلْقَيِّمُ ۚ فَلَا تَظْلِمُوا۟ فِيهِنَّ أَنفُسَكُمْ ۚ وَقَٰتِلُوا۟ ٱلْمُشْرِكِينَ كَآفَّةً كَمَا يُقَٰتِلُونَكُمْ كَآفَّةً ۚ وَٱعْلَمُوٓا۟ أَنَّ ٱللَّهَ مَعَ ٱلْمُتَّقِينَ ﴿٣٦﴾



(٣٢) (ئەوانە بەو بیروباوەڕە پووچانەیانەوە) دەیانەوێت نوورو ئاینی خوا بەقاڵەی دەمیان بکوژێننەوە و خامۆشی بکەن (بەلام خەیاڵیان خاوە) خوا ناهێڵێت ئاواتیان بێتە دی و هیچ شتێکی تری ناوێت جگە لەوە نەبێت ئاین و نووری خۆی سەربخات و نووری خۆی تەواو بکات و دەری بخات، هەرچەندە کافرو بێ باوەڕان پێی سەغڵەت و دڵتەنگ بن.

(٣٣) هەر ئەو زاتە بۆیە پێغەمبەرەکەی هاوڕێ لەگەڵ هیدایەت و ڕێنموویی و ئایینی ڕاست و دروستدا ڕەوانە کردووە تا سەری بخات بەسەر هەموو بەرنامە و ئاینەکانی تردا، هەرچەندە موشریک و هاوەڵگەران پێی سەغڵەت و دڵتەنگ بن.

(٣٤) ئەی ئەو کەسانەی باوەڕتان هێناوە، چاک بزانن کە زۆربەی حاخام و مالومەکانی جوو و قەشەی گاوران، ماڵ و سامانی خەڵکی بەناحەق دەخۆن، بەرهەڵستی ڕێباز و ئاینی خوا دەکەن، جا ئەوانەی کە ئاڵتون و زیو کۆ دەکەنەوە و قایمی دەکەن و لە پێناوی ڕێبازی خوادا و بۆ ڕەزامەندی ئەو، نایبەخشن، ئەوە مژدەی سزایەکی پڕ ئێشیان بدەرێ!!

(٣٥) (ئەو سزا سەختە) لە ڕۆژێکدا دەبێت ئەو پارە و سامانەی کۆیان کردۆتەوە، لە دۆزەخدا سوور دەکرێتەوە، ناوچاو و لاتەنیشت و پشتیانی پێ داخ دەکرێت، ئینجا پێیان دەوترێت: ئەمە ئەو سامانەیە کە کۆتان دەکردەوە بۆ خۆتان، دە بچێژن سزای ئەوەی کە بۆ خۆتان کۆدەکردەوە.

(٣٦) بێگومان ژمارەی مانگەکان لای خوا دوانزە مانگە، لەکتێبی خوادا (لە لوح المحفوظ)دا دیاریکراوە، هەر لەو ڕۆژەوە کە ئاسمانەکان و زەوی دروست کردووە، چوار مانگی بە حەرام داناوە (واتە جەنگ تیایدا نابێت بەرپا ببێت)، هەر ئەوەیە ئایین و بەرنامەی ڕاست و دروست، کەوابوو لەو مانگانەدا ستەم لە خۆتان مەکەن و جەنگ بەرپا مەکەن، بەڵکو تەنها دژی موشریکانی (شەڕەنگێز) هەمووتان بجەنگن بە گشتی هەروەکو ئەوان دژی ئێوە دەجەنگن بەگشتی، ئینجا بشزانن کە خوا یارو یاوەری ئەو کەسانەیە کە لێی دەترسن و پارێزکارن.

إِنَّمَا ٱلنَّسِيٓءُ زِيَادَةٞ فِي ٱلۡكُفۡرِۖ يُضَلُّ بِهِ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ يُحِلُّونَهُۥ عَامٗا وَيُحَرِّمُونَهُۥ عَامٗا لِّيُوَاطِـُٔواْ عِدَّةَ مَا حَرَّمَ ٱللَّهُ فَيُحِلُّواْ مَا حَرَّمَ ٱللَّهُۚ زُيِّنَ لَهُمۡ سُوٓءُ أَعۡمَٰلِهِمۡۗ وَٱللَّهُ لَا يَهۡدِي ٱلۡقَوۡمَ ٱلۡكَٰفِرِينَ ﴿٣٧﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مَا لَكُمۡ إِذَا قِيلَ لَكُمُ ٱنفِرُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ ٱثَّاقَلۡتُمۡ إِلَى ٱلۡأَرۡضِۚ أَرَضِيتُم بِٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا مِنَ ٱلۡأٓخِرَةِۚ فَمَا مَتَٰعُ ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا فِي ٱلۡأٓخِرَةِ إِلَّا قَلِيلٌ ﴿٣٨﴾ إِلَّا تَنفِرُواْ يُعَذِّبۡكُمۡ عَذَابًا أَلِيمٗا وَيَسۡتَبۡدِلۡ قَوۡمًا غَيۡرَكُمۡ وَلَا تَضُرُّوهُ شَيۡـٔٗاۗ وَٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٌ ﴿٣٩﴾ إِلَّا تَنصُرُوهُ فَقَدۡ نَصَرَهُ ٱللَّهُ إِذۡ أَخۡرَجَهُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ ثَانِيَ ٱثۡنَيۡنِ إِذۡ هُمَا فِي ٱلۡغَارِ إِذۡ يَقُولُ لِصَٰحِبِهِۦ لَا تَحۡزَنۡ إِنَّ ٱللَّهَ مَعَنَاۖ فَأَنزَلَ ٱللَّهُ سَكِينَتَهُۥ عَلَيۡهِ وَأَيَّدَهُۥ بِجُنُودٖ لَّمۡ تَرَوۡهَا وَجَعَلَ كَلِمَةَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ ٱلسُّفۡلَىٰۗ وَكَلِمَةُ ٱللَّهِ هِيَ ٱلۡعُلۡيَاۗ وَٱللَّهُ عَزِيزٌ حَكِيمٌ ﴿٤٠﴾

(٣٧) بەڕاستی دواخستن و دەستكاری كردنی ئەو مانگانەی كە جەنگ تیایاندا حەرامە، بۆ كاتێكی تر؛ سەركەشی و ڕۆچونێكی زیاترە لە كوفرو خوانەناسیدا، ئەوانەی كە بێ بڕوا بوون پێی‌گومڕا دەكرێن، ساڵێك ئەو دەستكاریە بەحەڵاڵ دادەنێن و ساڵێكیش بەحەرام، بۆ ئەوەی ئەو مانگانە ڕێك بكەون لەگەڵ ژمارەی ئەو مانگانەی كە خوا حەرامی كردوون، بەم جۆرە ئەوەی خوا حەرامی كردبوو حەڵاڵیان دەكرد، ئەوانە كردارە ناپەسەندەكانی خۆیان لاجوان كرابوو، خوایش هیدایەت و ڕێنموویی هۆزی بێ باوەڕان ناكات.

(٣٨) ئەی ئەو كەسانەی ئیمان و باوەڕتان هێناوە: ئەوە بۆچی كاتێك پێتان دەوترێت ڕاپەڕن و ئامادەبن و هێرش بەرن لە پێناوی ئاینی خوادا (دژی ئەو خوانەناسانەی كە خۆیان ئامادە كردووە بۆ كوژاندنەوەی نووری خوا) ئێوە لەشتان دادەهێزرێت و دەلكێن بەزەویداو زەمین گیردەبن (ئەڵبەتە ئەم بانگەوازە هەركاتێك لەلایەن سەركردایەتی حەكیم و داناو بڕوا پێ كراوەوە بڕیار درا، كە هەڵقولاوی ناو كۆمەڵگەی ئیماندارانە و ئەزموونی ساڵەها جیهادو خەباتی ژێر زەمینی هەیە، دەبێت لەلایەن هەموو ئیماندارانەوە پەیڕەوی بكرێت) ئایا ئێوە ڕازین بە ژیانی دنیاو بەگرنگتری دەزانن لە ژیانی نەبڕاوەی قیامەت لە بەهەشتی بەرین، بێگومان ژیانی دنیا بە بەراورد لەگەڵ ژیانی پڕ لە شادیی قیامەتدا زۆر زۆر كەم تەمەن و كەم خۆشی‌یە.

(٣٩) ئەگەر (بۆ جیهاد) ڕانەپەڕن و دەستبەكار نەبن، ئەوە سزایەكی زۆر بەئێشتان دەدات و كەسانێكی تر دەهێنێتە كایەوە لە ئێوە نەبن، وەنەبێت ئێوە بتوانن هیچ زەرەرو زیانێك بە خوا بگەیەنن، (بەنەچوونتان بەدەم بانگەوازی خواوە، بەڵكو نافەرمانی و دنیاپەرستی هەر زیان لە خۆتان دەدات)، خوایش هەمیشە بەسەر هەموو شتێكدا دەسەڵاتدارە.

(٤٠) ئەگەر ئێوە پشتگیری پێغەمبەر ﷺ نەكەن و یارمەتی نەدەن، ئەوە بەڕاستی خوا پشتگیری كردو سەری خست، كاتێك ئەوانەی بێباوەڕ بوون دەریان كرد لە شاری مەككە و یەكێك بوو لەو دوو كەسە كاتێك هەردوكیان لەناو ئەشكەوتەكەدا بوون (كاتێك بێ باوەڕەكان گەشتبوونە دەوروبەری ئەشكەوتەكە ئەبوبەكری هاوەڵی خەمی لێهات) پێغەمبەریش ﷺ دڵی دایەوە و پێی ووت: خەفەت مەخۆ، دڵنیابە خوامان لەگەڵە، ئەوسا ئیتر خوا ئاسوودەی و ئارامی خۆی دابەزاندە سەری و پشتگیری و بەهێزی كرد بە سەربازانێك كە ئێوە نەتاندەبینین و بەرنامەو ئاینی بێ باوەڕانی دانەواند و ریسواتری كرد، بەرنامەو ئاینی خوایش هەمیشە بەرزو بڵندترە، خوایش هەمیشە باڵادەست و دانایە.

انْفِرُوا۟ خِفَافًا وَثِقَالًا وَجَٰهِدُوا۟ بِأَمْوَٰلِكُمْ وَأَنفُسِكُمْ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ ۚ ذَٰلِكُمْ خَيْرٌ لَّكُمْ إِن كُنتُمْ تَعْلَمُونَ ﴿٤١﴾ لَوْ كَانَ عَرَضًا قَرِيبًا وَسَفَرًا قَاصِدًا لَّٱتَّبَعُوكَ وَلَٰكِنۢ بَعُدَتْ عَلَيْهِمُ ٱلشُّقَّةُ ۚ وَسَيَحْلِفُونَ بِٱللَّهِ لَوِ ٱسْتَطَعْنَا لَخَرَجْنَا مَعَكُمْ يُهْلِكُونَ أَنفُسَهُمْ وَٱللَّهُ يَعْلَمُ إِنَّهُمْ لَكَٰذِبُونَ ﴿٤٢﴾ عَفَا ٱللَّهُ عَنكَ لِمَ أَذِنتَ لَهُمْ حَتَّىٰ يَتَبَيَّنَ لَكَ ٱلَّذِينَ صَدَقُوا۟ وَتَعْلَمَ ٱلْكَٰذِبِينَ ﴿٤٣﴾ لَا يَسْتَـْٔذِنُكَ ٱلَّذِينَ يُؤْمِنُونَ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْءَاخِرِ أَن يُجَٰهِدُوا۟ بِأَمْوَٰلِهِمْ وَأَنفُسِهِمْ ۗ وَٱللَّهُ عَلِيمٌۢ بِٱلْمُتَّقِينَ ﴿٤٤﴾ إِنَّمَا يَسْتَـْٔذِنُكَ ٱلَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْءَاخِرِ وَٱرْتَابَتْ قُلُوبُهُمْ فَهُمْ فِى رَيْبِهِمْ يَتَرَدَّدُونَ ﴿٤٥﴾ ۞ وَلَوْ أَرَادُوا۟ ٱلْخُرُوجَ لَأَعَدُّوا۟ لَهُۥ عُدَّةً وَلَٰكِن كَرِهَ ٱللَّهُ ٱنۢبِعَاثَهُمْ فَثَبَّطَهُمْ وَقِيلَ ٱقْعُدُوا۟ مَعَ ٱلْقَٰعِدِينَ ﴿٤٦﴾ لَوْ خَرَجُوا۟ فِيكُم مَّا زَادُوكُمْ إِلَّا خَبَالًا وَلَأَوْضَعُوا۟ خِلَٰلَكُمْ يَبْغُونَكُمُ ٱلْفِتْنَةَ وَفِيكُمْ سَمَّٰعُونَ لَهُمْ ۗ وَٱللَّهُ عَلِيمٌۢ بِٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٤٧﴾



(٤١) (ئەی ئیمانداران هەر کاتێك داواکران بۆ غەزا لەلایەن سەرکردایەتیەکی متمانە پێکراوەوە): ئێوە بەچەکی سووك و سەنگین و بەسوارە و پیادەتانەوە راپەڕن و ئامادەبن و جیهاد و تێکۆشان بکەن بەماڵ و سامان و گیانتان لە پێناوی خوادا، ئەوە چاکترە بۆتان ئەگەر ئێوە بزانن و تێبگەن.

(٤٢) ئەگەر (غەزای تەبووك) دەستکەوتێکی ئاسان و نزیك بوایە، یا سەفەرێکی مامناوەندی بوایە، ئەوە دووڕووەکان شوێنت دەکەوتن، بەڵام رێگەی دوورو پڕ مەینەت بۆ ئەوان زەحمەتە، (جا لەوەودوا دێن) و سوێند بەزاتی خوا دەخۆن و دەڵێن: ئەگەر بمانتوانیایە ئەوە لەگەڵ ئێوەدا دەردەچووین و دەهاتین بۆ غەزا، ئەوانە بەو رەفتارو درۆیانەیان، خۆیان تیادەبەن، خوایش دەزانێت بەراستی ئەوانە درۆزنن.

(٤٣) خوا لێت خۆش بێت (ئەی پێغەمبەر ﷺ)! بۆ مۆڵەتت دانێ (نەدەبوایە مۆڵەتیان بدەیتێ) هەتا بەچاکی بۆت دەربکەوێت، کێ راستە و باوەڕ دامەزراوە، کێش درۆزن و دووڕووە.

(٤٤) (بەڵام) ئەوانەی باوەڕیان بەخواو بە رۆژی دوایی هەیە مۆڵەتت لێ ناخوازن (خۆ نادزنەوە لە جیهادو لە غەزا)، چونکە ئامادەن ماڵ و سامان و گیانیان بەخت بکەن لە پێناوی خوادا، خوایش زانایە بە خاوەن تەقواو پارێزکاران.

(٤٥) (بەڵکو) بەراستی تەنها ئەوانە مۆڵەتت لێ دەخوازن کە باوەڕ بەخواو بە رۆژی دوایی ناهێنن، ئەوانە هەمیشە دوودڵن و دڵە ڕاوکێیانە، بەردەوام لە گومانی خۆیاندا سەرگەردان و وێڵن و دێن و دەڕۆن.

(٤٦) ئەگەر ئەو دووڕووانە بیانویستایە دەرچن (بۆ غەزا) ئەوە خۆیان بۆ ئامادە دەکرد، بەڵام خوا چالاکی نواندن و دەرچوونی ئەوانی نەویست (چونکە دڵ و دەروون نەخۆش بوون)، لەبەر ئەوە سستی کردن و لەشی قورس کردن پێیان وترا: دانیشن بۆ خۆتان لەگەڵ پیرو منداڵ و پەککەوتەکاندا.

(٤٧) ئەوانە ئەگەر دەرچوونایە و لەناوتاندا بوونایە هیچیان بۆ ئێوە زیاد نەدەکرد بێجگە لە سستی نەبێت (لە ئاشووب و گێرە شێوێنی زیاتریان لە دەست نەدەهات) و دەستیان دەکرد بە چرپ و چاپ لەناوتاندا و دەگەران بۆ دۆزینەوەی کەلێنێك، بەئاواتی ئاشووب هەڵگیرساندن لە نێوانتاندا، کەسانێکیش هەن لەنێو ئێوەدا، گوێیان بۆ دەگرن، خوایش چاك ئاگادارە بە کاروکردەوەی ستەمکاران.

لَقَدِ ٱبْتَغَوُا۟ ٱلْفِتْنَةَ مِن قَبْلُ وَقَلَّبُوا۟ لَكَ ٱلْأُمُورَ حَتَّىٰ جَآءَ ٱلْحَقُّ وَظَهَرَ أَمْرُ ٱللَّهِ وَهُمْ كَٰرِهُونَ ﴿٤٨﴾ وَمِنْهُم مَّن يَقُولُ ٱئْذَن لِّى وَلَا تَفْتِنِّىٓ ۚ أَلَا فِى ٱلْفِتْنَةِ سَقَطُوا۟ ۗ وَإِنَّ جَهَنَّمَ لَمُحِيطَةٌۢ بِٱلْكَٰفِرِينَ ﴿٤٩﴾ إِن تُصِبْكَ حَسَنَةٌ تَسُؤْهُمْ ۖ وَإِن تُصِبْكَ مُصِيبَةٌ يَقُولُوا۟ قَدْ أَخَذْنَآ أَمْرَنَا مِن قَبْلُ وَيَتَوَلَّوا۟ وَّهُمْ فَرِحُونَ ﴿٥٠﴾ قُل لَّن يُصِيبَنَآ إِلَّا مَا كَتَبَ ٱللَّهُ لَنَا هُوَ مَوْلَىٰنَا ۚ وَعَلَى ٱللَّهِ فَلْيَتَوَكَّلِ ٱلْمُؤْمِنُونَ ﴿٥١﴾ قُلْ هَلْ تَرَبَّصُونَ بِنَآ إِلَّآ إِحْدَى ٱلْحُسْنَيَيْنِ ۖ وَنَحْنُ نَتَرَبَّصُ بِكُمْ أَن يُصِيبَكُمُ ٱللَّهُ بِعَذَابٍ مِّنْ عِندِهِۦٓ أَوْ بِأَيْدِينَا ۖ فَتَرَبَّصُوٓا۟ إِنَّا مَعَكُم مُّتَرَبِّصُونَ ﴿٥٢﴾ قُلْ أَنفِقُوا۟ طَوْعًا أَوْ كَرْهًا لَّن يُتَقَبَّلَ مِنكُمْ ۖ إِنَّكُمْ كُنتُمْ قَوْمًا فَٰسِقِينَ ﴿٥٣﴾ وَمَا مَنَعَهُمْ أَن تُقْبَلَ مِنْهُمْ نَفَقَٰتُهُمْ إِلَّآ أَنَّهُمْ كَفَرُوا۟ بِٱللَّهِ وَبِرَسُولِهِۦ وَلَا يَأْتُونَ ٱلصَّلَوٰةَ إِلَّا وَهُمْ كُسَالَىٰ وَلَا يُنفِقُونَ إِلَّا وَهُمْ كَٰرِهُونَ ﴿٥٤﴾

(٤٨) سوێند بە خوا (ئەو دووڕووانە) پێشتریش هەوڵیان داوە فیتنە و ئاشووب (لە نێوان ئیمانداراندا) بەرپا بکەن و چەندەها فەرمان و نەخشەیان گۆڕی بۆ ئەوەی فێڵت لێ بکەن و وورەت بڕوخێنن، هەتا خوا کردی حەق هات و سەرکەوت و دینی خوا پایەدار بوو، لەکاتێکدا ئەوان هەمیشە سەغڵەتن (بە پایەداری ئیسلام).

(٤٩) (لەو دووڕووە بێ چاوو ڕووانە) کەسانێک هەن کە دەڵێن: مۆڵەتم بدەو تووشی گوناهو سەرپێچیم مەکە!! (بەبیانووی ئەوەی لە غەزادا، لەوانەیە تووشی گوناهو هەڵە ببێت!!) لە حاڵێکدا ئەو جۆرە کەسانە با چاک بزانن کە لە گوناهو تاواندا ڕۆچوون، بێگومان دۆزەخیش گەمارۆی بێ باوەڕانی داوە و (ڕزگاربوونیان ئەستەمە).

(٥٠) (ئەی پێغەمبەر ﷺ) ئەگەر خێرو چاکەیەکت تووش بێت، ئەوە ئەوان پێی دڵتەنگ و سەغڵەت دەبن، خۆ ئەگەر بەڵاو ناخۆشیەکت تووش بێت ئەوە دەڵێن: ئێمە پێشتر دەستی خۆمانمان وەشاند (باشمان کرد نەچووین بۆ جەنگ، پێشبینی ئەمەمان دەکرد)، ئەوسا پشت هەڵدەکەن لە کاتێکدا ئەوان دڵخۆش و شادمانن!...

(٥١) (ئەی پێغەمبەر ﷺ) تۆش بڵێ: هەرگیز لەوە زیاترمان بۆ پێش نایەت و تووشمان نایەت جگە لەوەی کە خوا بۆی نوسیووین (هەرچیش بۆمان پێش دێت هەر خێرە بۆمان)، ئەوزاتە هەمیشە یارو یاوەرو پشتیوانمانە، دەبا ئیمانداران هەر پشت بەو خوایە ببەستن.

(٥٢) (بە دووڕووەکان و بێباوەڕان) بڵێ: ئایا ئێوە لە یەکێک لەو دوو سەرئەنجامە چاکە زیاتر چاوەڕوانی چیمان بۆ دەکەن، لەکاتێکدا هەردووکیان چاکن و ئاواتیان بۆ دەخوازین (کە: یان سەرکەوتنە، یان شەهید بوون) ئێمەش هەمیشە چاوەڕێی ئەوە دەکەین خوای گەورە بەڵاو سزایەکی تایبەتی خۆیتان بەسەردا ببارێنێت، یان بەدەستی ئێمە تووشی شکستی و نەهامەتی ببن، دە ئیتر ئێوە خۆتان مەڵاس بدەن و چاوەڕێ بن، بەڕاستی ئێمەش لەگەڵتاندا چاوەڕێین.

(٥٣) بە دووڕووەکان (کە دەیانەوێت لە ماڵ بەخشین خۆیان بشارنەوە) بڵێ: هەرچی دەبەخشن بە ڕەزامەندیی یان بەناچاریی هەرگیز لێتان وەرناگیرێت، چونکە بەڕاستی ئێوە کەسانێکی گوناهبارو باوەڕ دانەمەزراون.

(٥٤) هەر بۆیەش ئەوەی کە دەیبەخشن لێیان وەرناگیرێت، چونکە ئەوانە باوەڕیان بەخواو بەپێغەمبەرەکەی ﷺ نیە و نایەن بۆ نوێژ، مەگەر بەلەش بەباری و تەمەڵی نەبێت، ماڵ و سامانیش نابەخشن مەگەر لەکاتێکدا کە ئەوان نابەدڵ و سەغڵەتن.

فَلَا تُعْجِبْكَ أَمْوَٰلُهُمْ وَلَآ أَوْلَٰدُهُمْ ۚ إِنَّمَا يُرِيدُ ٱللَّهُ لِيُعَذِّبَهُم بِهَا فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا وَتَزْهَقَ أَنفُسُهُمْ وَهُمْ كَٰفِرُونَ ﴿٥٥﴾ وَيَحْلِفُونَ بِٱللَّهِ إِنَّهُمْ لَمِنكُمْ وَمَا هُم مِّنكُمْ وَلَٰكِنَّهُمْ قَوْمٌ يَفْرَقُونَ ﴿٥٦﴾ لَوْ يَجِدُونَ مَلْجَـًٔا أَوْ مَغَٰرَٰتٍ أَوْ مُدَّخَلًا لَّوَلَّوْا۟ إِلَيْهِ وَهُمْ يَجْمَحُونَ ﴿٥٧﴾ وَمِنْهُم مَّن يَلْمِزُكَ فِى ٱلصَّدَقَٰتِ فَإِنْ أُعْطُوا۟ مِنْهَا رَضُوا۟ وَإِن لَّمْ يُعْطَوْا۟ مِنْهَآ إِذَا هُمْ يَسْخَطُونَ ﴿٥٨﴾ وَلَوْ أَنَّهُمْ رَضُوا۟ مَآ ءَاتَىٰهُمُ ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥ وَقَالُوا۟ حَسْبُنَا ٱللَّهُ سَيُؤْتِينَا ٱللَّهُ مِن فَضْلِهِۦ وَرَسُولُهُۥٓ إِنَّآ إِلَى ٱللَّهِ رَٰغِبُونَ ﴿٥٩﴾ ۞ إِنَّمَا ٱلصَّدَقَٰتُ لِلْفُقَرَآءِ وَٱلْمَسَٰكِينِ وَٱلْعَٰمِلِينَ عَلَيْهَا وَٱلْمُؤَلَّفَةِ قُلُوبُهُمْ وَفِى ٱلرِّقَابِ وَٱلْغَٰرِمِينَ وَفِى سَبِيلِ ٱللَّهِ وَٱبْنِ ٱلسَّبِيلِ ۖ فَرِيضَةً مِّنَ ٱللَّهِ ۗ وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ ﴿٦٠﴾ وَمِنْهُمُ ٱلَّذِينَ يُؤْذُونَ ٱلنَّبِىَّ وَيَقُولُونَ هُوَ أُذُنٌ ۚ قُلْ أُذُنُ خَيْرٍ لَّكُمْ يُؤْمِنُ بِٱللَّهِ وَيُؤْمِنُ لِلْمُؤْمِنِينَ وَرَحْمَةٌ لِّلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ مِنكُمْ ۚ وَٱلَّذِينَ يُؤْذُونَ رَسُولَ ٱللَّهِ لَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿٦١﴾



(٥٥) (ئەی پێغەمبەرﷺ ئەی ئیماندار) نەماڵ و سامان و نە نەوەیان سەرسامت نەکات بەباشیان بزانیت، چونکە بەڕاستی خوا هەر دەیەوێت لە ژیانی دنیادا تووشی بەڵاو سزایان بکات لە ڕێگەی ماڵ و سامان و نەوەیانەوە و گیانیان دەربێت، لەکاتێکدا کە ئەوان بێ باوەڕن.

(٥٦) ئەوانە سوێندیش بە خوا دەخۆن کە بەڕاستی لە ئێوەن، (بەڵام درۆ دەکەن) ئەوانە هیچ کاتێک لە ئێوە نین، بەڵکو ئەوانە کەسانێکن کە لە ترسا خەریکن زیرە بکەن و ترسنۆکن.

(٥٧) خۆئەگەر پەنایەک یان چەند ئەشکەوتێک یان ژێر زەمینێکیان دەست بکەوێت ئەوە بەپەلە رووی تێدەکەن و لەکاتێکدا کە ئەوان هیچ شتێک جڵەویان ناگرێت(ئەوەندە لە بەشداربوونی غەزا دەترسن).

(٥٨) هەیانە تانەو تەشەر لە تۆ دەدات لە دابەشکردنی زەکات و دەستکەوتدا (پڕوپاگەندە دەکات کە گوایە عەدالەت و دادی تێدا نیە)، جا ئەوانە ئەگەر بەشیان بدرێت رازین، ئەگەر بێ بەش بکرێن لێی ئەوە خێرا ئەوان رق هەڵدەگرن و کینە لە سینە دەگرن.

(٥٩) خۆ ئەگەر ئەوانە رازی بوونایە بەو بەشەی خوا بە نسیبی کردوون و پێغەمبەرﷺ پێی بەخشیوون و بە دڵ بیانوتایە: خوامان بەسە (کە لێمان رازی بێت)، ئێمە فەرامۆش ناکات لەئایندەدا هەر پێمان دەبەخشێت لە فەزڵ و زیادە ڕێزی خۆی، پێغەمبەرەکەشی لەوەی دەستی دەکەوێت پێمان دەبەخشێت، بەڕاستی ئێمە ئاوات و مەبەستمان گەڕانەوەیە بۆ لای خواو بەدەستهێنانی رەزامەندیی ئەوە (ئەو کاتە پاداشتی هەردوو جیهانیان بۆ خۆیان مسۆگەر دەکرد).

(٦٠) بێگومان زەکات تەنها بۆ هەژارو نەداران و ئەو کەسانەی کەکارمەندن بەسەریەوە و بەو موسڵمانە نوێیانەی کە هێشتا ئیمان جێگیر نەبووە لەدڵیاندا و بۆ ئازادکردنی کۆیلەکان و بۆ (یارمەتیدانی) قەرزدارەکان و بۆ گەیاندنی ئایینی خوا (هەر بوارێک کە خزمەت بەبانگەوازی ئیسلام بکات و ئایینی خوا بەرەو پێش و سەرکەوتن ببات) هەروەها بۆ ئەو ڕێبوارانەش کە پارەیان لێ دەبڕێت و نەدار دەکەون، (دابەشکردنی زەکات بەو شێوەیە) فەرزە لە لایەن خواوە لەگەردنی ئیمانداراندا، خواش زاناو دانایە (لە سامان بەخشین و فەرزکردنی زەکاتدا).

(٦١) هەندێکی تر (لە دووڕووەکان) ئەوەندە نەفامن، ئازاری دڵی پێغەمبەرﷺ دەدەن، بەوەی کە دەڵێن: (محمد) گوێ بۆ هەموو کەس دەگرێت، پێیان بڵێ: گوێ بیستی خێرە بۆتان، باوەڕی پتەوی بەخوا هەیە، باوەڕی (بە ڕاستگۆیی) ئیماندارانیش هەیە، رەحمەتیشە بۆ ئەوانەتان کە باوەڕیان هێناوە، (بەڵام) ئەوانەی ئازاری پێغەمبەری خوا دەدەن سزایەکی بەئێش بۆیان ئامادەیە.

يَحۡلِفُونَ بِٱللَّهِ لَكُمۡ لِيُرۡضُوكُمۡ وَٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥٓ أَحَقُّ أَن يُرۡضُوهُ إِن كَانُواْ مُؤۡمِنِينَ ﴿٦٢﴾ أَلَمۡ يَعۡلَمُوٓاْ أَنَّهُۥ مَن يُحَادِدِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ فَأَنَّ لَهُۥ نَارَ جَهَنَّمَ خَٰلِدٗا فِيهَاۚ ذَٰلِكَ ٱلۡخِزۡيُ ٱلۡعَظِيمُ ﴿٦٣﴾ يَحۡذَرُ ٱلۡمُنَٰفِقُونَ أَن تُنَزَّلَ عَلَيۡهِمۡ سُورَةٞ تُنَبِّئُهُم بِمَا فِي قُلُوبِهِمۡۚ قُلِ ٱسۡتَهۡزِءُوٓاْ إِنَّ ٱللَّهَ مُخۡرِجٞ مَّا تَحۡذَرُونَ ﴿٦٤﴾ وَلَئِن سَأَلۡتَهُمۡ لَيَقُولُنَّ إِنَّمَا كُنَّا نَخُوضُ وَنَلۡعَبُۚ قُلۡ أَبِٱللَّهِ وَءَايَٰتِهِۦ وَرَسُولِهِۦ كُنتُمۡ تَسۡتَهۡزِءُونَ ﴿٦٥﴾ لَا تَعۡتَذِرُواْ قَدۡ كَفَرۡتُم بَعۡدَ إِيمَٰنِكُمۡۚ إِن نَّعۡفُ عَن طَآئِفَةٖ مِّنكُمۡ نُعَذِّبۡ طَآئِفَةَۢ بِأَنَّهُمۡ كَانُواْ مُجۡرِمِينَ ﴿٦٦﴾ ٱلۡمُنَٰفِقُونَ وَٱلۡمُنَٰفِقَٰتُ بَعۡضُهُم مِّنۢ بَعۡضٖۚ يَأۡمُرُونَ بِٱلۡمُنكَرِ وَيَنۡهَوۡنَ عَنِ ٱلۡمَعۡرُوفِ وَيَقۡبِضُونَ أَيۡدِيَهُمۡۚ نَسُواْ ٱللَّهَ فَنَسِيَهُمۡۚ إِنَّ ٱلۡمُنَٰفِقِينَ هُمُ ٱلۡفَٰسِقُونَ ﴿٦٧﴾ وَعَدَ ٱللَّهُ ٱلۡمُنَٰفِقِينَ وَٱلۡمُنَٰفِقَٰتِ وَٱلۡكُفَّارَ نَارَ جَهَنَّمَ خَٰلِدِينَ فِيهَاۚ هِيَ حَسۡبُهُمۡۚ وَلَعَنَهُمُ ٱللَّهُۖ وَلَهُمۡ عَذَابٞ مُّقِيمٞ ﴿٦٨﴾

(٦٢) دووڕووەکان، سوێندتان بە خوا بۆ دەخۆن تا بڕوایان پێبکەن و ڕازیتان بکەن، لەکاتێکدا کە حەق وایە خواو پێغەمبەرەکەی ڕازی بکەن ئەگەر ئەوانە باوەڕدارن...

(٦٣) مەگەر ئەوانە نازانن ئەو کەسەی کە دژایەتی خواو پێغەمبەرەکەی بکات، ئەوە بە ڕاستی ئاگری دۆزەخ بەشیەتی و بۆی ئامادەیە هاوڕێ لەگەڵ ژیانی نەبڕاوەشدا، ئا ئەوە ڕیسوایی و خەجاڵەتیەکی زۆر گەورەیە.

(٦٤) دووڕووەکان دەترسن لەوەی سوورەتێک دابەزێنرێتە سەریان، هەواڵیان بداتێ بەوەی لە دڵ و دەروونیاندایە، پێیان بڵێ: گاڵتە بکەن! بێگومان ئەوەی لێی دەترسن خوا هەر ئاشکرای دەکات (بۆ خۆتان و بۆ خەڵکیش).

(٦٥) (کاتێک تۆ ئەی پێغەمبەر ﷺ لەگوفتاری نابەجێیان ئاگادار دەبیت) و لێیان دەپرسیت (ئەوە خەریکی چین؟!) ئەوە بێگومان دەڵێن: بەڕاستی ئێمە تەنها دەمەتەقێ و گەمەو گاڵتەمان دەکرد، پێیان بڵێ: ئایا ئێوە بە خواو ئایەت و فەرمانەکانی و پێغەمبەرەکەی گاڵتەتان دەکرد؟!

(٦٦) (ئیتر بێ سوودە) پاکانە مەکەن، چونکە بەڕاستی ئێوە بێ باوەڕ بوون دوای ئەوەی لە ڕواڵەتدا باوەڕتان هێنابوو ئەگەر لە دەستەیەکتان خۆش ببین (دوای تەوبەی ڕاستەقینە) دەستەیەکتان هەر ئازار دەدەین (بەهۆی کاری نابەجێیەوە) چونکە بەڕاستی ئەوان تاوانبارو تاوانکار بوون.

(٦٧) دووڕووەکان لە پیاوان و لە ژنان سەر بەیەکترن و وەک یەکن لەم ڕەفتارانەدا: فەرمان بەگوناهو خراپە و تاوان دەدەن و قەدەغەی خێرو چاکە دەکەن و دەستیان دەنوقێنن (ماڵ و سامان بەشی کەس نادەن)، ئەوانە خوایان فەرامۆش کردووە، خوایش ئەوانی پشت گوێ خستووە، بەڕاستی دووڕووەکان هەرخۆیان یاخی و لە ئایین دەرچوون.

(٦٨) خوا (هەڕەشەی کردوە و) بەڵێنی ئاگری دۆزەخی بە دووڕووەکان لە پیاوان و ژنان و بەبێ باوەڕانیش داوە، کە بەردەوام و نەمرن تیایدا، ئەو دۆزەخەیان بەسە و کالا بەقەد باڵایەو خوا نەفرەتی لێکردوون و سزای بەردەوامیش بەشیانە و بۆیان ئامادەیە.

كَالَّذِينَ مِن قَبْلِكُمْ كَانُوٓا۟ أَشَدَّ مِنكُمْ قُوَّةً وَأَكْثَرَ أَمْوَٰلًا وَأَوْلَٰدًا فَٱسْتَمْتَعُوا۟ بِخَلَٰقِهِمْ فَٱسْتَمْتَعْتُم بِخَلَٰقِكُمْ كَمَا ٱسْتَمْتَعَ ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِكُم بِخَلَٰقِهِمْ وَخُضْتُمْ كَٱلَّذِى خَاضُوٓا۟ ۚ أُو۟لَٰٓئِكَ حَبِطَتْ أَعْمَٰلُهُمْ فِى ٱلدُّنْيَا وَٱلْءَاخِرَةِ ۖ وَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْخَٰسِرُونَ ﴿٦٩﴾ أَلَمْ يَأْتِهِمْ نَبَأُ ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ قَوْمِ نُوحٍ وَعَادٍ وَثَمُودَ وَقَوْمِ إِبْرَٰهِيمَ وَأَصْحَٰبِ مَدْيَنَ وَٱلْمُؤْتَفِكَٰتِ ۚ أَتَتْهُمْ رُسُلُهُم بِٱلْبَيِّنَٰتِ ۖ فَمَا كَانَ ٱللَّهُ لِيَظْلِمَهُمْ وَلَٰكِن كَانُوٓا۟ أَنفُسَهُمْ يَظْلِمُونَ ﴿٧٠﴾ وَٱلْمُؤْمِنُونَ وَٱلْمُؤْمِنَٰتُ بَعْضُهُمْ أَوْلِيَآءُ بَعْضٍ ۚ يَأْمُرُونَ بِٱلْمَعْرُوفِ وَيَنْهَوْنَ عَنِ ٱلْمُنكَرِ وَيُقِيمُونَ ٱلصَّلَوٰةَ وَيُؤْتُونَ ٱلزَّكَوٰةَ وَيُطِيعُونَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥٓ ۚ أُو۟لَٰٓئِكَ سَيَرْحَمُهُمُ ٱللَّهُ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ عَزِيزٌ حَكِيمٌ ﴿٧١﴾ وَعَدَ ٱللَّهُ ٱلْمُؤْمِنِينَ وَٱلْمُؤْمِنَٰتِ جَنَّٰتٍ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَا وَمَسَٰكِنَ طَيِّبَةً فِى جَنَّٰتِ عَدْنٍ ۚ وَرِضْوَٰنٌ مِّنَ ٱللَّهِ أَكْبَرُ ۚ ذَٰلِكَ هُوَ ٱلْفَوْزُ ٱلْعَظِيمُ ﴿٧٢﴾

(٦٩) (ئێوەش ئەی بێباوەڕان) وەک ئەو بێباوەڕانەن لە پێش ئێوەدا بوون، کە ئەوان لە ئێوە بەهێزتر بوون و ماڵ و منداڵیشیان لە ئێوە زیاتر بوو، ئینجا ماوەیەک بەو بەشەی کە هەیانبوو رایانبوارد، ئێوەش ماوەیەک راتانبوارد بە بەشەکەی خۆتان، هەروەک چۆن ئەوانەی پێش ئێوە رایانبوارد بە بەشەکانی خۆیان!! ئێوەش رۆچوون لە ئارەزووبازیدا وەک چۆن ئەوان رۆچوون لە ئارەزووبازیدا، ئا ئەوانە هەموو کارو کردەوەیەکیان پووچەڵ بۆتەوە و بەکەڵکیان نەهات لە دنیاوقیامەتدا ئا ئەوانە هەر خۆیان رەنج بەخەسارن.

(٧٠) ئایا ئەوانە هەواڵی گرنگی قەومەکانی پێش خۆیان پێ نەگەیشتووە (بەتایبەتی) قەومی نوح و عادو ثمود، قەومی ئیبراهیم و نیشتەجێکانی مەدیەن (قەومی شوعەیب)، هەروەها رەفتار نزم و بێ رەوشتەکان (قەومی لوط)، جا هەموو ئەو نەتەوانە پێغەمبەرەکانیان بەبەڵگەو نیشانەی ئاشکرایان بۆ هێنان، جا بەراستی وەنەبێت خوا ستەمی لێکردبن، بەڵکو ئەوان خۆیان ستەمیان لە خۆیان کرد.

(٧١) (لەو لاشەوە) ئیمانداران لە پیاوان و لە ئافرەتان هەندێکیان خۆشەویست و پشتگیرو هاوکاری یەکترن (کە ئەمەش سیفەتیانە): فەرمان بەچاکە دەدەن و قەدەغە لە خراپە دەکەن و نوێژەکانیان بەچاکی ئەنجام دەدەن و زەکاتی ماڵیشیان دەبەخشن و گوێڕایەڵ و فەرمانبەرداری خواو پێغەمبەرەکەی دەکەن، ئا ئەوانە لە ئایندەدا خوا رەحمیان پێ دەکات و سۆزی دەبێت بۆیان، بەراستی خوا باڵادەست و دانایە.

(٧٢) خوای گەورە بەڵێنی داوە بە ئیمانداران لە پیاوان و لە ئافرەتان، بەوەی کە باخەکانی بەهەشتیان پێ دەبەخشێت کە چەندەها روبار بەژێر درەختەکانیدا دەڕوات و جاریە بە بەردەم کۆشکەکانیاندا، هاوڕێ لەگەڵ ژیانی هەمیشەیی و نەبڕاوە تیایدا، هەروەها چەندەها جێگە و رێگە و کۆشک و تەلاری خۆش و رازاوەی تایبەتی لە بەهەشتداو لەناو باخی چڕوپڕی (عەدن) دا، لەگەڵ رەزامەندی خوای گەورەدا، کە لە هەموو نازو نیعمەتەکان بەنرخترو گرنگترە، ئەوە خۆی سەرفرازیەکی زۆر گەورە و بێ ئەندازەیە.

يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ جَٰهِدِ ٱلْكُفَّارَ وَٱلْمُنَٰفِقِينَ وَٱغْلُظْ عَلَيْهِمْ ۚ وَمَأْوَىٰهُمْ جَهَنَّمُ ۖ وَبِئْسَ ٱلْمَصِيرُ ﴿٧٣﴾ يَحْلِفُونَ بِٱللَّهِ مَا قَالُوا۟ وَلَقَدْ قَالُوا۟ كَلِمَةَ ٱلْكُفْرِ وَكَفَرُوا۟ بَعْدَ إِسْلَٰمِهِمْ وَهَمُّوا۟ بِمَا لَمْ يَنَالُوا۟ ۚ وَمَا نَقَمُوٓا۟ إِلَّآ أَنْ أَغْنَىٰهُمُ ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥ مِن فَضْلِهِۦ ۚ فَإِن يَتُوبُوا۟ يَكُ خَيْرًا لَّهُمْ ۖ وَإِن يَتَوَلَّوْا۟ يُعَذِّبْهُمُ ٱللَّهُ عَذَابًا أَلِيمًا فِى ٱلدُّنْيَا وَٱلْءَاخِرَةِ ۚ وَمَا لَهُمْ فِى ٱلْأَرْضِ مِن وَلِىٍّ وَلَا نَصِيرٍ ﴿٧٤﴾ ۞ وَمِنْهُم مَّنْ عَٰهَدَ ٱللَّهَ لَئِنْ ءَاتَىٰنَا مِن فَضْلِهِۦ لَنَصَّدَّقَنَّ وَلَنَكُونَنَّ مِنَ ٱلصَّٰلِحِينَ ﴿٧٥﴾ فَلَمَّآ ءَاتَىٰهُم مِّن فَضْلِهِۦ بَخِلُوا۟ بِهِۦ وَتَوَلَّوا۟ وَّهُم مُّعْرِضُونَ ﴿٧٦﴾ فَأَعْقَبَهُمْ نِفَاقًا فِى قُلُوبِهِمْ إِلَىٰ يَوْمِ يَلْقَوْنَهُۥ بِمَآ أَخْلَفُوا۟ ٱللَّهَ مَا وَعَدُوهُ وَبِمَا كَانُوا۟ يَكْذِبُونَ ﴿٧٧﴾ أَلَمْ يَعْلَمُوٓا۟ أَنَّ ٱللَّهَ يَعْلَمُ سِرَّهُمْ وَنَجْوَىٰهُمْ وَأَنَّ ٱللَّهَ عَلَّٰمُ ٱلْغُيُوبِ ﴿٧٨﴾ ٱلَّذِينَ يَلْمِزُونَ ٱلْمُطَّوِّعِينَ مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ فِى ٱلصَّدَقَٰتِ وَٱلَّذِينَ لَا يَجِدُونَ إِلَّا جُهْدَهُمْ فَيَسْخَرُونَ مِنْهُمْ ۙ سَخِرَ ٱللَّهُ مِنْهُمْ وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿٧٩﴾



(٧٣) ئەی پێغەمبەرﷺدژی کافرو دووڕووەکان بجەنگە و تێ بکۆشە و توند و تیژبە لەسەریان، ئەوانە سەرەنجام و مەنزڵگەیان دۆزەخە، ئای کە سەرەنجامێکی خراپ و ناشرینە.

(٧٤) (دووڕووەکان) سوێند بەخوا دەخۆن کە قسەیەکی نابەجێیان نەکردووە، کەچی سوێند بەخوا بەراستی ئەوانە درۆ دەکەن، بەڵکو گوفتاری کوفرو بێباوەڕی هات بەدەمیاندا، ئەوانە دوای موسڵمان بوونیان بێ باوەڕ بوونەوە، خەریکی (پیلان)و نەخشەیەک بوون بەڵام بۆیان نەلواو پێی نەگەیشتن (کە شەهید کردنی پێغەمبەر بووﷺ)، هیچ شتێک ئەوانی تووڕە نەکردووە، تەنها ئەوە نەبێت: خواو پێغەمبەرەکەی ﷺ ئیماندارانیان دەوڵەمەند و بەهرەوەر کرد لە فەزڵ و زیادە رێزی خۆی، جا ئەو دووڕووانە ئەگەر تەوبە بکەن و لە رەفتاری نادروستیان پاشگەز ببنەوە ئەوە چاکترە بۆیان، خۆ ئەگەر پشت هەڵکەن و(هەر خەریکی نەخشەو پیلان بن) ئەوە بێگومان خوا سزای بە ئازاریان دەدات لە دنیاو قیامەتدا، کەسیش یارو یاوەرو پشتیوانیان نابێت لە زەویدا.

(٧٥) (لە دووڕووەکان) کەسانێک هەن کە پەیمان و بەڵێنی بەخوا داوە: سوێند بەخوا ئەگەر خوا ماڵ و سامان و دارایمان پێببەخشێت، بەراستی زەکات و خێری لێدەکەین و بێگومان لە ریزی کەسانی چاک و خواناسیشدا دەبین.

(٧٦) جا کاتێک خوا لە فەزڵ و بەرەکەتی خۆی پێدان و بەهرەوەری کردن، ئەوان رەزیلیان تێدا کردو پشتیان لە بەڵێنەکەیان کرد لەکاتێکدا کە ئەوان هەمیشە لە بەڵێن و پەیمان پشت هەڵکەرن.

(٧٧) ئەوسا ئیتر بەهۆی ئەو بەڵێن شکاندنەیانەوە، خوا نەخۆشی دووڕوویی لە دڵ و دەروونیاندا چەسپاندو دامەزراند تا ئەو رۆژەی ئامادە دەبن (لەبەردەم دادگای خوایدا) بۆ لێپرسینەوە، چونکە نافەرمانی و سەرپێچیان کردووە لەو بەڵێنەی کە دایان بە خواو و بەهۆی ئەوەشەوە کە درۆیان دەکرد.

(٧٨) مەگەر ئایا ئەوانە نەیاندەزانی بەراستی خوای گەورە ئاگادارە بەنهێنی و چپەو سرتەیان؟ ئایا نەشیاندەزانی کە بەراستی خوا بەتەواوی زاناو ئاگایە بەهەموو نهێنی و شاراوەکان؟

(٧٩) ئەو بێ باوەڕانەی کە پلار دەگرنە ئەو ئیماندارانەی کە زیادە بەخشن لە خێر کردندا بەویستی خۆیان لە رێگەی خوادا و پلاریش لە ئیماندارانی هەژار دەگرن کە بێجگە لە رەنجی شانی خۆیان هیچی تریان دەست ناکەوێت، ئینجا هەر گاڵتەشیان پێدەکەن، ئەوانە خوا تۆڵەیان لێ دەسێنێت و ریسوایان دەکات، بەهۆی ئەو گاڵتە کردنەیانەوە و سزای بە ئێش و ئازاریش بەشیانە.

ٱسْتَغْفِرْ لَهُمْ أَوْ لَا تَسْتَغْفِرْ لَهُمْ إِن تَسْتَغْفِرْ لَهُمْ سَبْعِينَ مَرَّةً فَلَن يَغْفِرَ ٱللَّهُ لَهُمْ ۚ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ كَفَرُوا۟ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ ۗ وَٱللَّهُ لَا يَهْدِى ٱلْقَوْمَ ٱلْفَٰسِقِينَ ﴿٨٠﴾ فَرِحَ ٱلْمُخَلَّفُونَ بِمَقْعَدِهِمْ خِلَٰفَ رَسُولِ ٱللَّهِ وَكَرِهُوٓا۟ أَن يُجَٰهِدُوا۟ بِأَمْوَٰلِهِمْ وَأَنفُسِهِمْ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ وَقَالُوا۟ لَا تَنفِرُوا۟ فِى ٱلْحَرِّ ۗ قُلْ نَارُ جَهَنَّمَ أَشَدُّ حَرًّا ۚ لَّوْ كَانُوا۟ يَفْقَهُونَ ﴿٨١﴾ فَلْيَضْحَكُوا۟ قَلِيلًا وَلْيَبْكُوا۟ كَثِيرًا جَزَآءًۢ بِمَا كَانُوا۟ يَكْسِبُونَ ﴿٨٢﴾ فَإِن رَّجَعَكَ ٱللَّهُ إِلَىٰ طَآئِفَةٍ مِّنْهُمْ فَٱسْتَـْٔذَنُوكَ لِلْخُرُوجِ فَقُل لَّن تَخْرُجُوا۟ مَعِىَ أَبَدًا وَلَن تُقَٰتِلُوا۟ مَعِىَ عَدُوًّا ۖ إِنَّكُمْ رَضِيتُم بِٱلْقُعُودِ أَوَّلَ مَرَّةٍ فَٱقْعُدُوا۟ مَعَ ٱلْخَٰلِفِينَ ﴿٨٣﴾ وَلَا تُصَلِّ عَلَىٰٓ أَحَدٍ مِّنْهُم مَّاتَ أَبَدًا وَلَا تَقُمْ عَلَىٰ قَبْرِهِۦٓ ۖ إِنَّهُمْ كَفَرُوا۟ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ وَمَاتُوا۟ وَهُمْ فَٰسِقُونَ ﴿٨٤﴾ وَلَا تُعْجِبْكَ أَمْوَٰلُهُمْ وَأَوْلَٰدُهُمْ ۚ إِنَّمَا يُرِيدُ ٱللَّهُ أَن يُعَذِّبَهُم بِهَا فِى ٱلدُّنْيَا وَتَزْهَقَ أَنفُسُهُمْ وَهُمْ كَٰفِرُونَ ﴿٨٥﴾ وَإِذَآ أُنزِلَتْ سُورَةٌ أَنْ ءَامِنُوا۟ بِٱللَّهِ وَجَٰهِدُوا۟ مَعَ رَسُولِهِ ٱسْتَـْٔذَنَكَ أُو۟لُوا۟ ٱلطَّوْلِ مِنْهُمْ وَقَالُوا۟ ذَرْنَا نَكُن مَّعَ ٱلْقَٰعِدِينَ ﴿٨٦﴾

(٨٠) ئەی پێغەمبەرﷺ داوای لێخۆش بوون بۆ ئەو دووڕووانە بکەیت یان داوای لێخۆش بوونیان بۆ نەکەیت چوونیەکە، تەنانەت ئەگەر حەفتا جاریش داوای لێخۆشبوونیان بۆ بکەیت، ئەوە خوا هەرگیز لێیان خۆش نابێت، ئەوە چونکە بە راستی ئەوان باوەڕیان بە خواو پێغەمبەرەکەی نەبوو، خوایش هیدایەت و ڕێنمویی کەسانی گوناهکارو لە سنوور دەرچوو ناکات.

(٨١) (دووڕووەکان)، ئەوانەی کە بەجێهێڵران لەناو مەدینەدا شادمان بوون بەدانیشتنیان و دواکەوتنیان لە پێغەمبەرو نەچوونیان بۆ غەزا، حەزیان نەکرد جیهادو تێکۆشان بە خۆیان و ماڵیان لە پێناوی خوادا بکەن و بە ئیماندارانیان وت: لەم گەرمایەدا دەرمەچن بۆ جیهاد، ئەی محمدﷺ پێیان بڵێ: ئاگری دۆزەخ بەتینترو بەهێزترە لەگەرمیدا ئەگەر تێ بگەن و بیرو هۆشیان بخەنەکار.

(٨٢) جا (وازیان لێ بهێنە) باکەمێک پێبکەنن (لە دنیادا) و دەبێت زۆر بگرین (لە قیامەتدا) لە پاداشتی ئەو کارو کردەوەیەی دەیکەن.

(٨٣) ئەی پێغەمبەرﷺ جا ئەگەر خوا (لە غەزای تەبووک) تۆی گەڕاندەوە بۆ مەدینە، پاشان دەستەیەک لەو (دووڕوو دنیا پەرستانە) مۆڵەتیان لێ خواستیت تا لە ئایندەدا بەشداری غەزا بکەن و دەربچن لەگەڵ ئێوەدا، ئەوە تۆش پێیان بڵێ: ئیتر هەرگیز لەگەڵ مندا دەرناچن و هەرگیز نابێت لەگەڵ مندا بجەنگن دژ بە دوژمن، چونکە بەراستی ئێوە لە سەرەتاوە ڕازی بوون بەدانیشتن و نەهاتن، دە ئیتر هەر دانیشن لەگەڵ ئەوانەدا کە مانەوەو دواکەوتن و نەهاتن.

(٨٤) هیچ کات لەسەر هیچ کەس لەو دووڕووانە نوێژ نەکەی کە مرد، لەسەر گۆڕەکەشی مەوەستە، چونکە بەراستی ئەوانە باوەڕیان بە خواو بە پێغەمبەرەکەی نەبوو و مردیشن لەکاتێکدا لە دین دەرچوو بوون.

(٨٥) (ئەی پێغەمبەرﷺ ئەی ئیماندار) ماڵ و سامان و نەوەیان سەرسامت نەکات بەباشیان بزانیت، چونکە بەراستی خوا هەر دەیەوێت لە ژیانی دنیادا تووشی بەڵاو سزایان بکات لە ڕێگەی ماڵ و سامان و نەوەیانەوە و گیانیان دەربێت، لەکاتێکدا کە ئەوان بێ باوەڕن.

(٨٦) کاتێکیش سوورەتێک لە قورئان دابەزێنرێت و (داوایان لێ بکات) کە باوەڕ بەخوا بهێنن و لەگەڵ پێغەمبەرەکەیدا جیهاد بکەن و تێ بکۆشن و بچن بۆ غەزا، ئەوە دەسەڵاتدارو سەرمایەدارەکانیان (لە دووڕووەکان) مۆڵەتت لێ دەخوازن و دەڵێن: وازمان لێ بێنە تا لەگەڵ پەککەوتە و دانیشتووەکاندا بین.

رَضُوا بِأَن يَكُونُوا مَعَ الْخَوَالِفِ وَطُبِعَ عَلَى قُلُوبِهِمْ فَهُمْ لَا يَفْقَهُونَ ﴿٨٧﴾ لَكِنِ الرَّسُولُ وَالَّذِينَ آمَنُوا مَعَهُ جَاهَدُوا بِأَمْوَالِهِمْ وَأَنفُسِهِمْ وَأُولَئِكَ لَهُمُ الْخَيْرَاتُ وَأُولَئِكَ هُمُ الْمُفْلِحُونَ ﴿٨٨﴾ أَعَدَّ اللَّهُ لَهُمْ جَنَّاتٍ تَجْرِي مِن تَحْتِهَا الْأَنْهَارُ خَالِدِينَ فِيهَا ذَلِكَ الْفَوْزُ الْعَظِيمُ ﴿٨٩﴾ وَجَاءَ الْمُعَذِّرُونَ مِنَ الْأَعْرَابِ لِيُؤْذَنَ لَهُمْ وَقَعَدَ الَّذِينَ كَذَبُوا اللَّهَ وَرَسُولَهُ سَيُصِيبُ الَّذِينَ كَفَرُوا مِنْهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿٩٠﴾ لَيْسَ عَلَى الضُّعَفَاءِ وَلَا عَلَى الْمَرْضَى وَلَا عَلَى الَّذِينَ لَا يَجِدُونَ مَا يُنفِقُونَ حَرَجٌ إِذَا نَصَحُوا لِلَّهِ وَرَسُولِهِ مَا عَلَى الْمُحْسِنِينَ مِن سَبِيلٍ وَاللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿٩١﴾ وَلَا عَلَى الَّذِينَ إِذَا مَا أَتَوْكَ لِتَحْمِلَهُمْ قُلْتَ لَا أَجِدُ مَا أَحْمِلُكُمْ عَلَيْهِ تَوَلَّوا وَّأَعْيُنُهُمْ تَفِيضُ مِنَ الدَّمْعِ حَزَنًا أَلَّا يَجِدُوا مَا يُنفِقُونَ ﴿٩٢﴾ ۞ إِنَّمَا السَّبِيلُ عَلَى الَّذِينَ يَسْتَأْذِنُونَكَ وَهُمْ أَغْنِيَاءُ رَضُوا بِأَن يَكُونُوا مَعَ الْخَوَالِفِ وَطَبَعَ اللَّهُ عَلَى قُلُوبِهِمْ فَهُمْ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٩٣﴾

(٨٧) (سەیرە) ئەو ـ بەناو پیاوانە ـ رازی بوون کە لەگەڵ پیرە ژناندا بن و بمێننەوەو دڵیان مۆری بەسەردا نرابوو، ئەوانە (لە حەقیقەتی ئاین و پاداشتی جیهاد) حاڵی نین و تێناگەن.
(٨٨) بەلام پێغەمبەرﷺ و ئەوانەی کە لەگەڵیدا باوەڕیان هێناوە، جیهادو تێکۆشانیان کردووە (بۆ چەسپاندنی ئاینی خوا) بە ماڵ و سامان و گیانیانەوە، ئا ئەوانە هەرچی خێرو خۆشی هەیە بەشیانە و ئەوانە سەرفرازو سەربەرز و رزگارن.
(٨٩) (ئەو بەختەوەرانە) خوا چەندەها باخی بەهەشتی بۆ ئامادە کردوون کە چەندەها روبار بەژێر (درەختەکانی و بەبەردەم کۆشکەکانیدا) دەڕوات، هاورێ لەگەڵ ژیانی هەمیشەیی و نەبڕاوە تیایدا، ئەو سەرئەنجامە سەرکەوتن و سەرفرازیەکی زۆر گەورەیە.
(٩٠) (لەکاتی غەزای تەبووکدا) پاکانەکەران لە بیابان نشینانی عەرەب هاتنە (خزمەتی پێغەمبەرﷺ) بۆ ئەوەی مۆڵەتیان بدرێت کە نەچن بۆ جیهاد، هەروەها ئەوانەش کە درۆیان لەگەڵ خواو پێغەمبەرەکەیدا دەکرد دانیشتن و بەشداری غەزاکەیان نەکرد، ئەوانەی کە بێ باوەڕ بوون لەناو ئەوانەدا لەئاییندەدا سزایەکی پڕ ئێش و ئازاریان تووش دەبێت.
(٩١) لاوازو نەخۆش و ئەوانەش کە خەرجی‌یان دەست ناکەوێت، هیچ گوناهو گلەییەکیان لەسەر نیە (لە بەشداری نەکردنی غەزادا) کاتێک دڵسۆز بن بۆ خواو پێغەمبەرەکەی، لەسەر ئەو چاکەخواز و پاکانە هیچ جۆرە گلەیی و رەخنەیەک نیە، خوای گەورە لێخۆش بووە و میهرەبانیشە.
(٩٢) هەروەها گلەیی و رەخنە نیە لەسەر ئەو کەسانەی کە دێن بۆ لای تۆ بۆ ئەوەی وولاخی سواریان بۆ پەیدا بکەیت و بێن بۆ جیهاد، تۆش دەڵێت: هیچ شک نابەم تا بتاندەمێ بۆ سواری (ئیتر بە نائومێدی) گەڕانەوەو چاویان فرمێسکی لێ دەڕژا لە خەفەتدا ئەسرینی لێ دەباری چونکە هیچ شک نابەن بیبەخشن و خەرجی بکەن (لە پێناوی خوادا، چۆن لە غەزا دواکەوتن)!!.
(٩٣) بەڵکو تەنها گلەیی و رەخنە لەسەر ئەوانەیە کە مۆڵەتت لێ دەخوازن و خۆ دەدزنەوە، لەکاتێکدا کە دەوڵەمەند و دەست رۆیشتووشن، رازین لەگەڵ پیرە ژنان و پەککەوتواندابن و بمێننەوە، خوایش مۆری ناوە بەسەر دڵیاندا، بۆیە ئەوانە نازانن (خێر لە چیدایە).

يَعْتَذِرُونَ إِلَيْكُمْ إِذَا رَجَعْتُمْ إِلَيْهِمْ قُل لَّا تَعْتَذِرُوا لَن نُّؤْمِنَ لَكُمْ قَدْ نَبَّأَنَا اللَّهُ مِنْ أَخْبَارِكُمْ وَسَيَرَى اللَّهُ عَمَلَكُمْ وَرَسُولُهُ ثُمَّ تُرَدُّونَ إِلَىٰ عَالِمِ الْغَيْبِ وَالشَّهَادَةِ فَيُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴿٩٤﴾ سَيَحْلِفُونَ بِاللَّهِ لَكُمْ إِذَا انقَلَبْتُمْ إِلَيْهِمْ لِتُعْرِضُوا عَنْهُمْ فَأَعْرِضُوا عَنْهُمْ إِنَّهُمْ رِجْسٌ وَمَأْوَاهُمْ جَهَنَّمُ جَزَاءً بِمَا كَانُوا يَكْسِبُونَ ﴿٩٥﴾ يَحْلِفُونَ لَكُمْ لِتَرْضَوْا عَنْهُمْ فَإِن تَرْضَوْا عَنْهُمْ فَإِنَّ اللَّهَ لَا يَرْضَىٰ عَنِ الْقَوْمِ الْفَاسِقِينَ ﴿٩٦﴾ الْأَعْرَابُ أَشَدُّ كُفْرًا وَنِفَاقًا وَأَجْدَرُ أَلَّا يَعْلَمُوا حُدُودَ مَا أَنزَلَ اللَّهُ عَلَىٰ رَسُولِهِ وَاللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ ﴿٩٧﴾ وَمِنَ الْأَعْرَابِ مَن يَتَّخِذُ مَا يُنفِقُ مَغْرَمًا وَيَتَرَبَّصُ بِكُمُ الدَّوَائِرَ عَلَيْهِمْ دَائِرَةُ السَّوْءِ وَاللَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ ﴿٩٨﴾ وَمِنَ الْأَعْرَابِ مَن يُؤْمِنُ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ وَيَتَّخِذُ مَا يُنفِقُ قُرُبَاتٍ عِندَ اللَّهِ وَصَلَوَاتِ الرَّسُولِ أَلَا إِنَّهَا قُرْبَةٌ لَّهُمْ سَيُدْخِلُهُمُ اللَّهُ فِي رَحْمَتِهِ إِنَّ اللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿٩٩﴾

(٩٤) کاتێک ئێوە لە غەزا دەگەڕێنەوە دووڕووەکان دێن بۆ لاتان و داوای لێ بووردنتان لێ دەکەن!! پێیان بڵێ: داوای لێ بووردن مەکەن، هەرگیز باوەڕتان پێناکەین، خوایش ئاگاداری کردووین لە هەموو هەواڵ و هەڵس و کەوت و گوفتارو نیەتێکتان، لەئایندەدا خواو پێغەمبەرەکەی کارو کردەوەتان دەبینن (لەسەر کوفر دەمێننەوە یاخود پەشیمان دەبنەوە؟)، پاشان دەبرێنەوە بۆ لای ئەو زاتەی کە زانا و ئاگای پەنهان و ئاشکرایە، ئینجا ئاگادارتان دەکاتەوە بەو کارو کردەوەیەی کە دەیکەن.

(٩٥) کە ئێوە گەڕانەوە (لە غەزا) بۆ لایان سوێندتان بۆ دەخۆن بە خوا بۆ ئەوەی وازیان لێ بهێنن و سەرزەنشتیان نەکەن، جا ئێوەش وازیان لێ بهێنن و پشتیان تێبکەن، چونکە بەڕاستی ئەوانە (دڵ و دەروون) پیسن، شوێن و جێگەیان دۆزەخە لە پاداشتی ئەو کارو کردەوەی کە دەیانکرد.

(٩٦) هەر سوێندتان بۆ دەخۆن تا لێیان ڕازی بن و چاوپۆشییان لێبکەن، خۆ ئەگەر ئێوە ڕازی بن لێیان، ئەوە بێگومان خوا لە کەسانی لە ئایین دەرچوو ڕازی نابێت.

(٩٧) زۆربەی عەرەبە کۆچەری و دێهاتی و بیابان نشینەکان (لە عەرەبە شارنشینەکان) دڵ ڕەقترن لە بارەی کوفرو دووڕوویییەوە (چونکە دوورن لە سەرچاوەکانی زانست و مەدەنیەتەوە)، شایستەترن ئەو سنوورانە نەزانن کە: خوا ناردوویەتیە خوارەوە بۆ پێغەمبەرەکەی (دەربارەی حەڵاڵ و حەرام) خوای گەورەش زاناو دانایە (بە بەندەکانی).

(٩٨) هەر لەو عەرەبە بیابان نشینانە، کەسانێکیان هەیە کە ئەوەی دەیبەخشێت بەسەرانە و غەرامەی دەزانێت چاوەڕێی ئەوە دەکەن چەندەها بەڵاو ناخۆشی بێتە سەرتان، یاخوا مەینەتی خراپ بەسەر ئەواندا بێت، خوایش هەمیشە بیسەرە (بە گوفتاریان)، زانایە (بە نیەتیان).

(٩٩) لەو عەرەبە بیابان نشینانە کەسانی تریان هەیە کە ئیمان و باوەڕ بەخواو بەرۆژی دوایی ئەهێنن و ئەوەی خەرجی دەکەن و دەیبەخشن بەچەندەها هەنگاوی نزیک بوونەوەی لای خوای دادەنێن و بۆ ئەوەی بەهرەمەند بن لە چەندەها دۆعای خێری پێغەمبەرﷺ، ـ ئاگاداربن ـ بەڕاستی ئەو بەخشینەیان مایەی سەرفرازی و نزیک بوونەوەیانە لە خواوە، سەرئەنجام خوا دەیانخاتە ژێر سایەی ڕەحمەتیەوە، بەڕاستی خوا لێخۆشبوو میهرەبانە.

وَٱلسَّٰبِقُونَ ٱلۡأَوَّلُونَ مِنَ ٱلۡمُهَٰجِرِينَ وَٱلۡأَنصَارِ وَٱلَّذِينَ ٱتَّبَعُوهُم بِإِحۡسَٰنٖ رَّضِيَ ٱللَّهُ عَنۡهُمۡ وَرَضُواْ عَنۡهُ وَأَعَدَّ لَهُمۡ جَنَّٰتٖ تَجۡرِي تَحۡتَهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَآ أَبَدٗاۚ ذَٰلِكَ ٱلۡفَوۡزُ ٱلۡعَظِيمُ ﴿١٠٠﴾ وَمِمَّنۡ حَوۡلَكُم مِّنَ ٱلۡأَعۡرَابِ مُنَٰفِقُونَۖ وَمِنۡ أَهۡلِ ٱلۡمَدِينَةِ مَرَدُواْ عَلَى ٱلنِّفَاقِ لَا تَعۡلَمُهُمۡۖ نَحۡنُ نَعۡلَمُهُمۡۚ سَنُعَذِّبُهُم مَّرَّتَيۡنِ ثُمَّ يُرَدُّونَ إِلَىٰ عَذَابٍ عَظِيمٖ ﴿١٠١﴾ وَءَاخَرُونَ ٱعۡتَرَفُواْ بِذُنُوبِهِمۡ خَلَطُواْ عَمَلٗا صَٰلِحٗا وَءَاخَرَ سَيِّئًا عَسَى ٱللَّهُ أَن يَتُوبَ عَلَيۡهِمۡۚ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٞ رَّحِيمٌ ﴿١٠٢﴾ خُذۡ مِنۡ أَمۡوَٰلِهِمۡ صَدَقَةٗ تُطَهِّرُهُمۡ وَتُزَكِّيهِم بِهَا وَصَلِّ عَلَيۡهِمۡۖ إِنَّ صَلَوٰتَكَ سَكَنٞ لَّهُمۡۗ وَٱللَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ ﴿١٠٣﴾ أَلَمۡ يَعۡلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ هُوَ يَقۡبَلُ ٱلتَّوۡبَةَ عَنۡ عِبَادِهِۦ وَيَأۡخُذُ ٱلصَّدَقَٰتِ وَأَنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلتَّوَّابُ ٱلرَّحِيمُ ﴿١٠٤﴾ وَقُلِ ٱعۡمَلُواْ فَسَيَرَى ٱللَّهُ عَمَلَكُمۡ وَرَسُولُهُۥ وَٱلۡمُؤۡمِنُونَۖ وَسَتُرَدُّونَ إِلَىٰ عَٰلِمِ ٱلۡغَيۡبِ وَٱلشَّهَٰدَةِ فَيُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمۡ تَعۡمَلُونَ ﴿١٠٥﴾ وَءَاخَرُونَ مُرۡجَوۡنَ لِأَمۡرِ ٱللَّهِ إِمَّا يُعَذِّبُهُمۡ وَإِمَّا يَتُوبُ عَلَيۡهِمۡۗ وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٞ ﴿١٠٦﴾

(١٠٠) خوای میهرەبان لەوانەی کە پێشکەوتن و یەکەم کەس بوون لە ئیسلام بوون و خزمەت کردنی ئیسلامدا لەکاروانی کۆچبەران و پشتیوانان و ئەوانەی کە بە ڕێکوپێکی شوێنیان کەوتوون، رازی بووەو ئەوانیش لەو رازی بوون، باخەکانی بەهەشتی بۆ ئامادە کردوون کە چەندەها رووبار بە بەردەم کۆشکەکانی و بەژێر درەختەکانیدا دەڕوات، هاوڕێ لەگەڵ نەمریدا بۆ هەمیشەیش تیایدا دەمێننەوە، ئەو سەرئەنجامە سەرکەوتنێکی زۆر گەورەیە.

(١٠١) لەو ناوچانەی دەوروبەرتان هەندێ عەرەبی بیابان نشینی دووڕوو هەن و هەندێ لە دانیشتوانی شار(المدينة) راهاتوون لەسەر دووڕووی و زرنگن لەو بارەیەوە، تۆ (ئەی پێغەمبەر ﷺ) نایانناسیت، بەڵکو ئێمە دەیانناسین، لەمەودوا ئەوانە هەر لە دنیادا دووجار ئازاریان دەدەین، پاشان دەبرێنەوە بەرەو سزاو ئازارێکی زۆر سەخت و دژوار.

(١٠٢) (بێجگە لەوانە) کەسانێکی تریش هەن کە دان بەگوناهو هەڵەکانیاندا دەنێن و کرداری چاک و کرداری خراپیشیان تێکەڵ کردووە، ئەمانە نزیکە خوا تەوبەیان لێ وەربگرێت، چونکە بەڕاستی خوا لێخۆشبوو میهرەبانە.

(١٠٣) لە هەندێ ماڵ و سامانی ئەو (ئیماندارانە) زەکات و خێر وەربگرە، چونکە دەبێتە هۆی خاوێن کردنەوەی ماڵەکەیان و پاککردنەوەی دڵ و دەروونیان و دۆعای داباریني رەحمەت بکە بەسەریاندا و ئەگەر مردیشن نوێژیان لەسەر بکە، چونکە بەڕاستی دۆعاو نوێژکردنی تۆ مایەی دڵنیایی و ئارامییە بۆیان، خوایش هەمیشە بیسەرو زانایە.

(١٠٤) ئایا نەیانزانیووە کە بەڕاستی خوا خۆی تەوبە قبوڵ دەکات لە بەندەکانی و هەموو خێر و سەدەقەیەکیشیان لێ وەردەگرێت و بەڕاستی خوا خۆی تەوبە وەرگرو میهرەبانە.

(١٠٥) بەو خەڵکە بڵێ: ئێوە هەرچی دەتوانن لە کارو کردەوە ئەنجامی بدەن، چونکە خوا کارو کردەوەتان دەبینێت و (ئاگادارە بە نهێنی و ئاشکرای)، هەروەها پێغەمبەرەکەشی (ئاگادار دەکات کاتێک لە ژیاندایە، دوای وەفاتیشی بۆ خوای گەورە ئاسانە کە نیشانی بدات)، هەروەها ئیماندارانیش (ئاسەوارو دەرئەنجامی دەبینن)، پاشان دەگەڕێنرێنەوە بۆ لای ئەو خوایەی کە زانایە بەنهێنی و ئاشکرا، ئەوسا ئاگادارتان دەکات لە هەموو ئەو کارو کردەوانەی کە ئەنجامی دەدەن.

(١٠٦) کەسانێکی تریش هەن (لە بەجێ ماوەکان) ئەنجامی کردەوەیان دواخراوە بۆ فەرمانی خوا، یان سزایان دەدات (ئەگەر بەردەوام بن لەسەر دووڕووی) یاخود تەوبەیان لێ وەردەگرێت (ئەگەر پەشیمان بن)، خوای گەورەش هەمیشە زاناو دانایە.

وَالَّذِينَ اتَّخَذُوا مَسْجِدًا ضِرَارًا وَكُفْرًا وَتَفْرِيقًا بَيْنَ الْمُؤْمِنِينَ وَإِرْصَادًا لِمَنْ حَارَبَ اللَّهَ وَرَسُولَهُ مِنْ قَبْلُ وَلَيَحْلِفُنَّ إِنْ أَرَدْنَا إِلَّا الْحُسْنَىٰ وَاللَّهُ يَشْهَدُ إِنَّهُمْ لَكَاذِبُونَ ﴿١٠٧﴾ لَا تَقُمْ فِيهِ أَبَدًا لَمَسْجِدٌ أُسِّسَ عَلَى التَّقْوَىٰ مِنْ أَوَّلِ يَوْمٍ أَحَقُّ أَنْ تَقُومَ فِيهِ فِيهِ رِجَالٌ يُحِبُّونَ أَنْ يَتَطَهَّرُوا وَاللَّهُ يُحِبُّ الْمُطَّهِّرِينَ ﴿١٠٨﴾ أَفَمَنْ أَسَّسَ بُنْيَانَهُ عَلَىٰ تَقْوَىٰ مِنَ اللَّهِ وَرِضْوَانٍ خَيْرٌ أَمْ مَنْ أَسَّسَ بُنْيَانَهُ عَلَىٰ شَفَا جُرُفٍ هَارٍ فَانْهَارَ بِهِ فِي نَارِ جَهَنَّمَ وَاللَّهُ لَا يَهْدِي الْقَوْمَ الظَّالِمِينَ ﴿١٠٩﴾ لَا يَزَالُ بُنْيَانُهُمُ الَّذِي بَنَوْا رِيبَةً فِي قُلُوبِهِمْ إِلَّا أَنْ تَقَطَّعَ قُلُوبُهُمْ وَاللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ ﴿١١٠﴾ ۞ إِنَّ اللَّهَ اشْتَرَىٰ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ أَنْفُسَهُمْ وَأَمْوَالَهُمْ بِأَنَّ لَهُمُ الْجَنَّةَ يُقَاتِلُونَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ فَيَقْتُلُونَ وَيُقْتَلُونَ وَعْدًا عَلَيْهِ حَقًّا فِي التَّوْرَاةِ وَالْإِنْجِيلِ وَالْقُرْآنِ وَمَنْ أَوْفَىٰ بِعَهْدِهِ مِنَ اللَّهِ فَاسْتَبْشِرُوا بِبَيْعِكُمُ الَّذِي بَايَعْتُمْ بِهِ وَذَٰلِكَ هُوَ الْفَوْزُ الْعَظِيمُ ﴿١١١﴾



(١٠٧) ئەو (دووڕووانەی) کە مزگەوتێکیان دروستکرد لەبەر زەرەردان و بلاوکردنەوەی بێ باوەڕی و دووبەرەکی بەرپاکردن لەنێوان ئیمانداراندا و بۆ چاوەڕوان کردنی هاتنی ئەو کەسانەی کە پێشتر دوژمنایەتی و جەنگیان دژی خواو پێغەمبەرەکەی دەکرد و بێگومان سوێند دەخۆن کە: ئێمە تەنها مەبەستمان چاکە بووە، (لە کاتێکدا) خوایش شایەتی دەدات کە بەڕاستی ئەوانە درۆزنن.

(١٠٨) هەرگیز لەو مزگەوتەدا رامەوەستە بۆ نوێژ کردن (چونکە) بەڕاستی مزگەوتێک شایستەیە کە تۆ تیایدا بوەستیت بۆ نوێژ کردن تیایدا کە هەر لە یەکەم ڕۆژەوە لەسەر بنچینەی تەقواو خواناسی دروست کراوە، (چونکە) لەو مزگەوتەدا چەند کەسانێکی مەردی تیادایە کە زۆر حەز دەکەن خۆیان خاوێن رابگرن (لە دەروون و رواڵەتدا)، خوایش بەردەوام ئەوانەی خۆش دەوێت کە خۆیان پاک رادەگرن.

(١٠٩) جا ئایا ئەو کەسەی کە مزگەوت و کارو شوێنی لەسەر بنچینەی تەقواو لە خواترسان دروست کردبێت و ڕەزامەندی خوای مەبەست بێت چاکترە؟! یاخود ئەو کەسەی کە بینای مزگەوت شوێن و بەرنامە وکاری لەسەر لێواری کەندەلانێکی بێ هێزو رووخاو دامەزراندبێت، ئینجا لەگەڵ خۆیدا بڕوخێتە ناو ئاگری دۆزەخەوە، خوای گەورەش ڕێنموویی ئەو دەستە ستەمکارە ناکات.

(١١٠) ئەو بینایەی دووڕووەکان دروستیان کرد بەردەوام هۆی گومان و زیادبوونی دڵە ڕاوکێیە لە دڵیاندا، هەتا ئەو کاتەی کە دڵیان دەپچڕێت و دەمرن، بێگومان خوا زانایە (بەپیلانی دووڕووەکان) دانایە (لە هەڵوەشاندنەوە و پووچ کردنەوەیدا).

(١١١) بەڕاستی خوا، گیان و ماڵی لە ئیمانداران کڕیوە بەوەی کە بەهەشت بۆ ئەوانەو بەشیانە (بەڕاستی پەروەردگارێکی بەخشندەیە، هەر خۆی بەخشێنەری گیان و ماڵ وسامانە، کەچی ئاوا مامەڵە دەکات لەگەڵ ئیمانداراندا و نرخێکی نەبڕاوە، نرخێکی زۆر گەورەی بۆ بڕیارداوە، کاتێک لە پێناوی ئەودا دەیبەخشن) ئەوانە دەجەنگن لە پێناوی ئاینی خوادا، دوژمنانی ئاینی خوا دەکوژن (لە گۆڕەپانی جەنگدا)، یان دەکوژرێن و (شەهید دەکرێن)، ئەو پاداشت و بەڵێنە بەڕاستی لەسەر خوایە و باس کراوە لە تەورات و ئینجیل و قورئاندا، جا کێ هەیە بە قەدەر خوا بەوەفاو بەئەمەک بێت بۆ جێ بەجێکردنی بەڵێنەکانی، کەواتە زۆر دڵخۆش و کامەران بن بەو مامەڵەیەی کە ئەنجامتانداوە و بەو فرۆشتن و کڕینەی کە لەسەری ڕێککەوتوون، بێگومان هەر ئەوەشە سەرفرازی و سەرکەوتنی نەبڕاوە و بێ سنوور.

ٱلتَّٰٓئِبُونَ ٱلْعَٰبِدُونَ ٱلْحَٰمِدُونَ ٱلسَّٰٓئِحُونَ ٱلرَّٰكِعُونَ ٱلسَّٰجِدُونَ ٱلْءَامِرُونَ بِٱلْمَعْرُوفِ وَٱلنَّاهُونَ عَنِ ٱلْمُنكَرِ وَٱلْحَٰفِظُونَ لِحُدُودِ ٱللَّهِ وَبَشِّرِ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴿١١٢﴾ مَا كَانَ لِلنَّبِيِّ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ أَن يَسْتَغْفِرُوا۟ لِلْمُشْرِكِينَ وَلَوْ كَانُوٓا۟ أُو۟لِى قُرْبَىٰ مِنۢ بَعْدِ مَا تَبَيَّنَ لَهُمْ أَنَّهُمْ أَصْحَٰبُ ٱلْجَحِيمِ ﴿١١٣﴾ وَمَا كَانَ ٱسْتِغْفَارُ إِبْرَٰهِيمَ لِأَبِيهِ إِلَّا عَن مَّوْعِدَةٍ وَعَدَهَآ إِيَّاهُ فَلَمَّا تَبَيَّنَ لَهُۥٓ أَنَّهُۥ عَدُوٌّ لِّلَّهِ تَبَرَّأَ مِنْهُ إِنَّ إِبْرَٰهِيمَ لَأَوَّٰهٌ حَلِيمٌ ﴿١١٤﴾ وَمَا كَانَ ٱللَّهُ لِيُضِلَّ قَوْمًۢا بَعْدَ إِذْ هَدَىٰهُمْ حَتَّىٰ يُبَيِّنَ لَهُم مَّا يَتَّقُونَ إِنَّ ٱللَّهَ بِكُلِّ شَىْءٍ عَلِيمٌ ﴿١١٥﴾ إِنَّ ٱللَّهَ لَهُۥ مُلْكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ يُحْىِۦ وَيُمِيتُ وَمَا لَكُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ مِن وَلِىٍّ وَلَا نَصِيرٍ ﴿١١٦﴾ لَّقَد تَّابَ ٱللَّهُ عَلَى ٱلنَّبِىِّ وَٱلْمُهَٰجِرِينَ وَٱلْأَنصَارِ ٱلَّذِينَ ٱتَّبَعُوهُ فِى سَاعَةِ ٱلْعُسْرَةِ مِنۢ بَعْدِ مَا كَادَ يَزِيغُ قُلُوبُ فَرِيقٍ مِّنْهُمْ ثُمَّ تَابَ عَلَيْهِمْ إِنَّهُۥ بِهِمْ رَءُوفٌ رَّحِيمٌ ﴿١١٧﴾

(١١٢) (جا ئەوانەی ئەو مامەڵەیە دەکەن پێشتر بەم سیفەتە پیرۆزانە خۆیان رازاندۆتەوە): تەوبەکارن و لەهەڵەکانیان پەشیمانن، خواپەرستن (لە هەموو هەڵس و کەوتیاندا)، سوپاسگوزارن (لەسەر هەموو نازو نیعمەتێک)، گەڕۆکن (لەسەر زەویدا، ئەندێشەو بیرو هۆش بەکاردەهێنن بۆ بیرکردنەوە لە بوونەوەرو دەوروبەر)، سوژدەبەرو کڕنووشبەرو نوێژ خوێنن، فەرماندەرن بەهەموو چاکەیەک، قەدەغەی خراپەو هەموو نادروستیەک دەکەن و پارێزەرن بۆ سنوورەکانی خواو قەدەغەکراوەکانی، ئینجا مژدە بدە بەئیمانداران (ئەوانەی ئەو سیفاتانە لە خۆیاندا دەهێننە دی).

(١١٣) بۆ پێغەمبەرو ئەوانەی کە باوەڕیان هێناوە، رەوا نیە داوای لێ خۆشبوون بۆ موشریک و هاوەڵگەران بکەن هەر چەندە ئەوانە خزمی نزیکیش بن، دوای ئەوەی کە بۆیان روون بۆتەوە کە بەراستی ئەوانە نیشتەجێی دۆزەخن (بەهۆی بێ دینی و تاوان و گوناهیانەوە).

(١١٤) جا داوای لێخۆش بوونی ئیبراهیم بۆ باوکی لەبەر بەڵێنێک بوو کە پێی دابوو، کاتێک بۆی دەرکەوت بەراستی باوکی دوژمنی خوایە، ئیتر خۆی لێ بەری کرد، بەڕاستی ئیبراهیم زۆر بەسۆزو دڵ نەرم بوو و زۆر خاوەن حیلم بوو.

(١١٥) هەرگیز خوا کەسانێک گومڕا ناکات دوای ئەوەی کە هیدایەتی داون، هەتا بۆیان روون نەکاتەوە کە دەبێت لە چی خۆیان بپارێزن، بەراستی خوا بەهەموو شتێک زانایە.

(١١٦) بەڕاستی هەر بۆ خوایە خاوەنداریەتی ئاسمانەکان و زەوی، ئەو خوایە ژیان دەبەخشێت و مردنیش پێش دەهێنێت، هەرگیز جگە لە خوا کەستان دەست ناکەوێت کە یارو یاوەرتان بێت و پشتیوانیتان لێ بکات.

(١١٧) سوێند بەخوا بەراستی خوا تەوبەی قبوڵ کرد لە پێغەمبەرو کۆچبەران و پشتیوانان، ئەوانەی کە شوێنی پێغەمبەرکەوتن لەکاتی سەغڵەتی و تەنگانەدا (لە غەزای تەبووکدا)، دوای ئەوەی کە خەریک بوو دڵی دەستەیەکیان لە خشتە بچێت و (بێزاری دەربڕێت)، لەوەودوا تەوبەو پەشیمانی ئەوانیشی قبوڵ کرد، چونکە بەراستی ئەو پەروەردگارە بەسۆزو میهرەبانە لەگەڵیاندا.

وَعَلَى ٱلثَّلَٰثَةِ ٱلَّذِينَ خُلِّفُواْ حَتَّىٰٓ إِذَا ضَاقَتْ عَلَيْهِمُ ٱلْأَرْضُ بِمَا رَحُبَتْ وَضَاقَتْ عَلَيْهِمْ أَنفُسُهُمْ وَظَنُّوٓاْ أَن لَّا مَلْجَأَ مِنَ ٱللَّهِ إِلَّآ إِلَيْهِ ثُمَّ تَابَ عَلَيْهِمْ لِيَتُوبُوٓاْ إِنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلتَّوَّابُ ٱلرَّحِيمُ ﴿١١٨﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَكُونُواْ مَعَ ٱلصَّٰدِقِينَ ﴿١١٩﴾ مَا كَانَ لِأَهْلِ ٱلْمَدِينَةِ وَمَنْ حَوْلَهُم مِّنَ ٱلْأَعْرَابِ أَن يَتَخَلَّفُواْ عَن رَّسُولِ ٱللَّهِ وَلَا يَرْغَبُواْ بِأَنفُسِهِمْ عَن نَّفْسِهِۦ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ لَا يُصِيبُهُمْ ظَمَأٌ وَلَا نَصَبٌ وَلَا مَخْمَصَةٌ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ وَلَا يَطَـُٔونَ مَوْطِئًا يَغِيظُ ٱلْكُفَّارَ وَلَا يَنَالُونَ مِنْ عَدُوٍّ نَّيْلًا إِلَّا كُتِبَ لَهُم بِهِۦ عَمَلٌ صَٰلِحٌ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُضِيعُ أَجْرَ ٱلْمُحْسِنِينَ ﴿١٢٠﴾ وَلَا يُنفِقُونَ نَفَقَةً صَغِيرَةً وَلَا كَبِيرَةً وَلَا يَقْطَعُونَ وَادِيًا إِلَّا كُتِبَ لَهُمْ لِيَجْزِيَهُمُ ٱللَّهُ أَحْسَنَ مَا كَانُواْ يَعْمَلُونَ ﴿١٢١﴾ ۞ وَمَا كَانَ ٱلْمُؤْمِنُونَ لِيَنفِرُواْ كَآفَّةً فَلَوْلَا نَفَرَ مِن كُلِّ فِرْقَةٍ مِّنْهُمْ طَآئِفَةٌ لِّيَتَفَقَّهُواْ فِى ٱلدِّينِ وَلِيُنذِرُواْ قَوْمَهُمْ إِذَا رَجَعُوٓاْ إِلَيْهِمْ لَعَلَّهُمْ يَحْذَرُونَ ﴿١٢٢﴾

(١١٨) هەروەها تەوبەی ئەو سێ کەسەشی وەرگرت کە (لە غەزای تەبووک) دواخران دوای ئەوەی کە زەوی چەندە فراوانە لێیان تەنگ بۆوە، خۆیشیان لە خۆیان بێزار بوون، دڵنیاش بوون کە هیچ پەنایەک نیە (لەخەشم و قینی خوا بیانپارێزێت) جگە لەوەی خۆیان بدەنە پەنای ئەو زاتە، پاشان تەوبەی لێ وەرگرتن، تا تەوبە بکەن، بەڕاستی هەرخوا تەوبە وەرگرو میهرەبانە.

(لە غەزای تەبووکدا سیان لە هاوەڵان بێ هیچ بیانوویەک خۆیان دواخست کە بریتی بوون لە {کەعبی‌کوڕی مالیک} و{مەرارەی‌کوڕی رەبیع} و { هیلالی کوڕی ئومەییە}، کاتێک پێغەمبەر ﷺ گەڕایەوە، دوورووەکان دەهاتن و هەریەک بە بیانویەک پاکانەیان دەکرد، بەڵام ئەوسێ ئیمانداره هیچ بیانویەکیان نەبوو، دانیان بە هەڵەی خۆیاندا نا، پێغەمبەریش ﷺ فەرمانیدا کەکەس قسەیان لە گەڵدا نەکات و دەبێت نەچن بەلای خێزانەکانیاندا، ئەم تەمێ کردنەش، پەنجا شەوی خایاند).

(١١٩) ئەی ئەوانەی ئیمان و باوەڕتان هێناوە لەخوا بترسن و پارێزکار بن، هەوڵ بدەن هەمیشە لەگەڵ ڕاستگۆیان و ڕاستاندا بن.

(١٢٠) ڕەوا نەبوو بۆ دانیشتوانی مەدینە و بیابان نشینانی دەوروبەری دوا بکەون (لە جیهادو غەزا) لە خزمەت پێغەمبەری خوادا ﷺ و خۆیان خۆشتر بوێت لەو، چونکە ئەوە بەڕاستی هیچ تینوویەتی و ماندوو بوون و برسێتیەکیان تووش نەدەهات لە پێناوی خوادا (بەزایە بچێت)و نەدەچوونە هیچ شوێنێک و پێیان نەدەخستە هیچ جێیەک بێ باوەڕان پێی سەغڵەت بن و دەستیان لە هیچ دوژمنێک نەدەوەشان، کە نەبێتە هۆی ئەوەی بە کارو کردەوەیەکی چاک بۆیان تۆمار نەکرێت، بەڕاستی خوا پاداشتی چاکەکاران بە زایە نادات.

(١٢١) هەروەها هیچ بەخشنێکیان پێشکەش نەدەکرد بچوک یان گەورە و بە هیچ دۆڵ و شیوێکدا تێ نەدەپەڕین، بە چاکە بۆیان تۆمار نەکرێت، تا خوا بەچاکترین شێوە پاداشتی ئەو کردەوانەیان بداتەوە کە دەیانکرد.

(١٢٢) جا ڕەوا نیە هەرچی ئیمانداران هەیە بەجارێک بچن بۆ غەزا (یان بۆ هەرکارێکی پێویست)، دەی بۆچی لە هەر هۆزو دەستەیەک، کەسانێک نەچوون بۆ خوێندن تا شارەزابن لەئاییندا تێبگەن و فێربن و قەومەکەشیان تێبگەیەنن و فێریان بکەن کاتێک کە گەڕانەوە بۆ لایان، بۆ ئەوەی ئەوان هوشیار ببنەوە خۆیان بپارێزن لە گوناهو خوا لە خۆ نەڕەنجێنن.

يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ قَٰتِلُواْ ٱلَّذِينَ يَلُونَكُم مِّنَ ٱلْكُفَّارِ وَلْيَجِدُواْ فِيكُمْ غِلْظَةًۚ وَٱعْلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ مَعَ ٱلْمُتَّقِينَ ﴿١٢٣﴾ وَإِذَا مَآ أُنزِلَتْ سُورَةٌ فَمِنْهُم مَّن يَقُولُ أَيُّكُمْ زَادَتْهُ هَٰذِهِۦٓ إِيمَٰنًاۚ فَأَمَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ فَزَادَتْهُمْ إِيمَٰنًا وَهُمْ يَسْتَبْشِرُونَ ﴿١٢٤﴾ وَأَمَّا ٱلَّذِينَ فِى قُلُوبِهِم مَّرَضٌ فَزَادَتْهُمْ رِجْسًا إِلَىٰ رِجْسِهِمْ وَمَاتُواْ وَهُمْ كَٰفِرُونَ ﴿١٢٥﴾ أَوَلَا يَرَوْنَ أَنَّهُمْ يُفْتَنُونَ فِى كُلِّ عَامٍ مَّرَّةً أَوْ مَرَّتَيْنِ ثُمَّ لَا يَتُوبُونَ وَلَا هُمْ يَذَّكَّرُونَ ﴿١٢٦﴾ وَإِذَا مَآ أُنزِلَتْ سُورَةٌ نَّظَرَ بَعْضُهُمْ إِلَىٰ بَعْضٍ هَلْ يَرَىٰكُم مِّنْ أَحَدٍ ثُمَّ ٱنصَرَفُواْۚ صَرَفَ ٱللَّهُ قُلُوبَهُم بِأَنَّهُمْ قَوْمٌ لَّا يَفْقَهُونَ ﴿١٢٧﴾ لَقَدْ جَآءَكُمْ رَسُولٌ مِّنْ أَنفُسِكُمْ عَزِيزٌ عَلَيْهِ مَا عَنِتُّمْ حَرِيصٌ عَلَيْكُم بِٱلْمُؤْمِنِينَ رَءُوفٌ رَّحِيمٌ ﴿١٢٨﴾ فَإِن تَوَلَّوْاْ فَقُلْ حَسْبِىَ ٱللَّهُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَۖ عَلَيْهِ تَوَكَّلْتُۖ وَهُوَ رَبُّ ٱلْعَرْشِ ٱلْعَظِيمِ ﴿١٢٩﴾

سُورَةُ يُونُسَ

(١٢٣) ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە بجەنگن دژی ئەو بێ باوەڕانەی کەلێتان نزیک دەبنەوە بە دەوروبەرتاندان (نیازی شەڕ فرۆشتنیان هەیە) و باتوندو تیژی و هێزو تواناتان تیادا بەدی بکەن، بشزانن بەراستی خوا یارو یاوەری پارێزکارانە.

(١٢٤) کاتێکیش سوورەتێک لە قورئان دابەزێنرا، هەندێک لە (دووڕووەکان بەگاڵتە پێ کردنەوە) دەڵێن: کێتان ئەم سوورەتە باوەڕی زیاد کردووە؟! جا ئەوانەی کە باوەڕیان هێنابوو ئەوەندەی تر ئیمان و باوەڕی پتەوتر کردن، ئەوانیش مژدە بەیەکتر دەدەن (دەربارەی سەرکەوتن و خۆشی هەردوو جیهان).

(١٢٥) ئەوانەش کە نەخۆشی بێ دینی و دووڕوویی لە دڵیاندایە، ئەوە سەرباری پیسی و ناپوختی خۆیان ئەوەندەی تر سورەتەکە پیسی و ناپوختیان زیاد دەکات، دەشمرن لەکاتێکدا کە بێ باوەڕن.

(١٢٦) ئایا (دوو ڕووەکان) نابینن و نازانن بەراستی ئەوان لە هەموو ساڵێکدا جارێک یان دووجار تاقی دەکرێنەوە، پیلان و نەخشەیان دەردەکەوێت و (سووک و ریسوا دەبن)، پاشان تەوبە ناکەن و پەشیمان نابنەوەو یاداوەریش وەرناگرن و ئەوان بیرناکەنەوە.

(١٢٧) کاتێکیش سوورەتێک لە قورئان دابەزێنرا (ئەوانە سەغڵەتن)، ئەوە هەندێکیان تەماشای هەندێکی تریان دەکەن (حەز دەکەن زوو ئەو شوێنە جێ بهێڵن، بەچپە یان بەئیشارەت) دەڵێن: ئایا هیچ کەس دەتانبینێت (لە ئیمانداران)، پاشان بەنهێنی خۆیان دزیەوەو ڕۆشتن، لەکاتێکدا خوای بالادەستیش دڵی ئەوانی وەرچەرخاندووە، چونکە بەراستی ئەوانە کەسانێکن کە تێ ناگەن و حاڵی نین (ناشیانەوێت تێبگەن).

(١٢٨) (ئەی خەڵکینە) سوێند بەخوا بێگومان پێغەمبەرێکتان بۆ رەوانە کراوە کە هەر یەکێکە لە خۆتان، زۆر سەختە بەلایەوە تووش بوونتان بەبەڵاو ناخۆشی، زۆر بەتەنگیشتانەوەیە و پەرۆشە لەسەرتان، زۆر دڵسۆزی ئیماندارانە و میهرەبان و دلۆڤانە بۆیان.

(١٢٩) جا ئەگەر ئەوانە (لەگەڵ ئەو هەموو دڵسۆزیی و میهرەبانیەی تۆدا) هەر پشت هەڵکەن و گوێت بۆ نەگرن، ئەوە ئیتر تۆ بڵێ: من خوام بەسە یارو یاوەرم بێت، کە پشتگیرو یاریدەدەرم بێت، هیچ خوایەک نیە جگە لەو، هەر پشت بەو دەبەستم، ئەو زاتەش پەروەردگاری عەرشی گەورەیە.

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

الٓر تِلْكَ ءَايَٰتُ ٱلْكِتَٰبِ ٱلْحَكِيمِ ﴿١﴾ أَكَانَ لِلنَّاسِ عَجَبًا أَنْ أَوْحَيْنَآ إِلَىٰ رَجُلٍ مِّنْهُمْ أَنْ أَنذِرِ ٱلنَّاسَ وَبَشِّرِ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ أَنَّ لَهُمْ قَدَمَ صِدْقٍ عِندَ رَبِّهِمْ ۗ قَالَ ٱلْكَٰفِرُونَ إِنَّ هَٰذَا لَسَٰحِرٌ مُّبِينٌ ﴿٢﴾ إِنَّ رَبَّكُمُ ٱللَّهُ ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ فِى سِتَّةِ أَيَّامٍ ثُمَّ ٱسْتَوَىٰ عَلَى ٱلْعَرْشِ ۖ يُدَبِّرُ ٱلْأَمْرَ ۖ مَا مِن شَفِيعٍ إِلَّا مِنۢ بَعْدِ إِذْنِهِۦ ۚ ذَٰلِكُمُ ٱللَّهُ رَبُّكُمْ فَٱعْبُدُوهُ ۚ أَفَلَا تَذَكَّرُونَ ﴿٣﴾ إِلَيْهِ مَرْجِعُكُمْ جَمِيعًا ۖ وَعْدَ ٱللَّهِ حَقًّا ۚ إِنَّهُۥ يَبْدَؤُا۟ ٱلْخَلْقَ ثُمَّ يُعِيدُهُۥ لِيَجْزِىَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ بِٱلْقِسْطِ ۚ وَٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ لَهُمْ شَرَابٌ مِّنْ حَمِيمٍ وَعَذَابٌ أَلِيمٌۢ بِمَا كَانُوا۟ يَكْفُرُونَ ﴿٤﴾ هُوَ ٱلَّذِى جَعَلَ ٱلشَّمْسَ ضِيَآءً وَٱلْقَمَرَ نُورًا وَقَدَّرَهُۥ مَنَازِلَ لِتَعْلَمُوا۟ عَدَدَ ٱلسِّنِينَ وَٱلْحِسَابَ ۚ مَا خَلَقَ ٱللَّهُ ذَٰلِكَ إِلَّا بِٱلْحَقِّ ۚ يُفَصِّلُ ٱلْءَايَٰتِ لِقَوْمٍ يَعْلَمُونَ ﴿٥﴾ إِنَّ فِى ٱخْتِلَٰفِ ٱلَّيْلِ وَٱلنَّهَارِ وَمَا خَلَقَ ٱللَّهُ فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ لَءَايَٰتٍ لِّقَوْمٍ يَتَّقُونَ ﴿٦﴾

## سوورەتی (یونس)

**بەناوی خوای بەخشندە و میهرەبان**

(١) سەرنجی سەرەتای سوورەتی (البقرة) بدە، ئەو ئایەت و فەرمانانەی (لەم سوورەتەدا هەیە) چەند ئایەت و فەرمانێکی ئەو قورئانە پڕ لە داناییەیە.

(٢) ئایا چ سەرسوڕمانێکی بۆ خەڵکی تێدایە کە ئێمە وەحی و نیگامان نارد بۆ پیاوێک لە خۆیان کە: خەڵکی بێدار بکەرەوە و دایان بچڵەکێنە (تا خواناس و خواپەرست بن) و مژدە بدە بەوانەی باوەڕیان هێناوە کە بێگومان پلەو پایەی بەرزو بڵندیان بۆهەیە لای پەروەردگاریان، کەچی بێ باوەڕان وتیان: بەراستی ئەم (محمد ناوە) جادووگەرێکی ئاشکرایە!.

(٣) بەراستی پەروەردگاری ئێوە (الله) یە، ئەو زاتەیە کە ئاسمانەکان و زەوی لە شەش ڕۆژدا دروست کردووە، لەوەودوا لەسەر تەختی فەرمانڕەوایی وەستا (ئەڵبەتە چۆنیەتی وەستان و تەختی فەرمانڕەوایەتی و گەلێ شتی لەو بابەتانە لە رادەی بۆچوونی ئێمە بەدەرە، تەفسیری ئەم ئایەتەیان لە پێشەوا مالیک و ئەحمەد پرسیوە، لە وەڵامدا وتوویانە: وەستانەکە حەقیقەتی هەیە، چۆنیەتیەکەی شاراوەیە، پرسیارکردن دەربارەی بیدعەیە، باوەڕ بوون پێی واجبە)، هەر خۆیشی پلانی هەموو شتێک دائەنێت و هەموو شتێک ڕێک ئەخات، هیچ کەس نیە شەفاعەتخواز و تکاکار بێت، مەگەر دوای مۆڵەتی ئەو زاتە، ئەو خوایە پەروەردگارتانە، کەوابوو بیپەرستن، جا ئایا بۆچی یادەوەری وەرناگرن و بیر ناکەنەوە؟!.

(٤) گەڕانەوەی هەر هەمووتان بۆ لای ئەو زاتەیە، بەڵێنی خوا هەمیشە راستە و دروستە و نەگۆڕە، بەراستی خۆی سەرەتا دروست کراوان بەدی دەهێنێت و دوایش وەک خۆیان لێدەکاتەوە (تا لە قیامەتدا) ئەوانەی کە باوەڕیان هێناوە و کارو کردەوە چاکەکانیان ئەنجامداوە بە دادپەروەری پاداشتیان بداتەوە، ئەوانەش کە بێباوەڕ بوون خواردنەوەی لەکوڵ و سزای بە ئێش و ئازاریان بۆ ئامادەیە بەهۆی ئەوەی کە بڕوایان پێ نەئەکرد.

(٥) خوا ئەو زاتەیە کە خۆری کردووە بەسەرچاوەی تیشک و رووناکیەکی پرشنگدار، مانگیشی کردووە بە سەرچاوەی رووناکی، چەندەها جێگەی هەڵهاتن و ئاوابوونیشی بۆ دیاری کردووە (جگە لەوەی هەرشەوە بەشێوەیەک خۆی دەنوێنێت) تا بزانن و بیکەنە بنەمای ساڵژمێری و حساب راگرتن، خوای گەورە ئەوەی بەبێ مەبەست دروست نەکردووە، بەڵکو هەمووی لەسەر بنچینەی حەق و راستی بەدیهێناوە، بەو شێوەیە ئەو زاتە ئایەت و بەڵگە و موعجیزەکانی روون دەکاتەوە بۆ کەسانێک کە بیانزانن و تێی بگەن.

(٦) بەراستی لە جیاوازی شەوو ڕۆژو ئەو شتانەدا کە خوا لە ئاسمانەکان و زەویدا دروستی کردوون، بەڵگە و نیشانەی زۆرن بۆ کەسانێک کە لە خوا بترسن و دینداری بکەن.

إِنَّ ٱلَّذِينَ لَا يَرْجُونَ لِقَآءَنَا وَرَضُوا۟ بِٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا وَٱطْمَأَنُّوا۟ بِهَا وَٱلَّذِينَ هُمْ عَنْ ءَايَـٰتِنَا غَـٰفِلُونَ ﴿٧﴾ أُو۟لَـٰٓئِكَ مَأْوَىٰهُمُ ٱلنَّارُ بِمَا كَانُوا۟ يَكْسِبُونَ ﴿٨﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّـٰلِحَـٰتِ يَهْدِيهِمْ رَبُّهُم بِإِيمَـٰنِهِمْ ۖ تَجْرِى مِن تَحْتِهِمُ ٱلْأَنْهَـٰرُ فِى جَنَّـٰتِ ٱلنَّعِيمِ ﴿٩﴾ دَعْوَىٰهُمْ فِيهَا سُبْحَـٰنَكَ ٱللَّهُمَّ وَتَحِيَّتُهُمْ فِيهَا سَلَـٰمٌ ۚ وَءَاخِرُ دَعْوَىٰهُمْ أَنِ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَـٰلَمِينَ ﴿١٠﴾ ۞ وَلَوْ يُعَجِّلُ ٱللَّهُ لِلنَّاسِ ٱلشَّرَّ ٱسْتِعْجَالَهُم بِٱلْخَيْرِ لَقُضِىَ إِلَيْهِمْ أَجَلُهُمْ ۖ فَنَذَرُ ٱلَّذِينَ لَا يَرْجُونَ لِقَآءَنَا فِى طُغْيَـٰنِهِمْ يَعْمَهُونَ ﴿١١﴾ وَإِذَا مَسَّ ٱلْإِنسَـٰنَ ٱلضُّرُّ دَعَانَا لِجَنۢبِهِۦٓ أَوْ قَاعِدًا أَوْ قَآئِمًا فَلَمَّا كَشَفْنَا عَنْهُ ضُرَّهُۥ مَرَّ كَأَن لَّمْ يَدْعُنَآ إِلَىٰ ضُرٍّ مَّسَّهُۥ ۚ كَذَٰلِكَ زُيِّنَ لِلْمُسْرِفِينَ مَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴿١٢﴾ وَلَقَدْ أَهْلَكْنَا ٱلْقُرُونَ مِن قَبْلِكُمْ لَمَّا ظَلَمُوا۟ ۙ وَجَآءَتْهُمْ رُسُلُهُم بِٱلْبَيِّنَـٰتِ وَمَا كَانُوا۟ لِيُؤْمِنُوا۟ ۚ كَذَٰلِكَ نَجْزِى ٱلْقَوْمَ ٱلْمُجْرِمِينَ ﴿١٣﴾ ثُمَّ جَعَلْنَـٰكُمْ خَلَـٰٓئِفَ فِى ٱلْأَرْضِ مِنۢ بَعْدِهِمْ لِنَنظُرَ كَيْفَ تَعْمَلُونَ ﴿١٤﴾



(٧) بەڕاستی ئەوانەی کە بەتەمای ئامادەبوونی بەر بارەگای ئێمە نین و (باوەڕیان پێی نیە) و رازی بوون بەژیانی ئەم دنیایە و دڵنیا بوون پێی و دڵیان پێی خۆشبوو و ئەوانەش کە خۆیان غافڵ و بێ ئاگان لە ئایەت و نهێنی دروست کراوەکانی ئێمە، (سەرنجی نادەن و بیری لێناکەنەوە)...

(٨) ئا ئەوانە شوێن و جێگەیان ئاگرە بەهۆی ئەو کارو کردەوانەی کە دەیانکرد.

(٩) بەڕاستی ئەوانەی کە باوەڕیان هێناوەو کارو کردەوە چاکەکانیان ئەنجامداوە، پەروەردگاریان بە هۆی ئیمان و باوەڕی (ڕێک و پێک و دامەزراویانەوە) هیدایەت و ڕێنموییان دەکات (بۆ ئەنجامدانی هەموو کارو کردەوەیەکی چاک، لەو جیهانیشدا) لەناو بەهەشتە جۆراوجۆرە پڕ لە نازو نیعمەتەکاندا چەندەها روبار بەبەردەمیاندا دەڕوات.

(١٠) دوعاو پاڕانەوەیان (لە بەهەشتدا ئەمەیە): پەروەردگارا، پاکی و بێگەردی و ستایش شایستەی تۆیە ئەی خوای میهرەبان، چاک و چۆنیشیان لەوێ سەلامکردنە، دواهەمین گوفتاریشیان دوای هەموو نازو نیعمەتێک، دوای هەموو بەخششێک ئەوەیە کە: پڕ بە دڵ، لە ناخی دەروونیانەوە بەڕاستی دەڵێن: الحمد لله رب العالمین.

(١١) ئەگەر خوا خەڵکی تووشی شەڕو ناخۆشی بە زوویی بکردایە (لەسەر داخوازی خۆیان کاتێک تەنگەتاو دەبن) هەروەکو چۆن بۆ داخوازی خێر پەلەیانە، ئەوە هەر هەموویان کۆتایی بەژیانیان دەهێنرا (بەڵام خوای گەورە واناکات، بەڵکو دەفەرموێت) جا ئەوانەی بەتەمانین ئامادەی بەردەم بارەگای ئێمە ببنەوە (باوەڕیان پێی نیە)، ماوەیەک وازیان لێدەهێنین تا لە ستەمیاندا رۆبچن و سەرگەردان بن.

(١٢) کاتێکیش ئادەمیزاد (ئەوانەیان کە باوەڕ لە دەروونیاندا بەچاکی دانەمەزراوە) زیان و ناخۆشیەکی تووش بێت، ئەوە هاناو هاوار بۆ ئێمە دەهێنێت بۆ لابردنی، لەکاتی راکشاندا، یان بە دانیشتنەوە، یان بە پێوە بێت، جا کاتێک زەرەر و زیانەکەی لێ دوور دەخەینەوە و دەکەوێتەوە باری ئاسایی، هەروا دەڕوات بەرێدا و بارودۆخی ئەوسای فەرامۆش دەکات، هەروەک رۆژێ لە رۆژان هاواری لە ئێمە نەکردبێت و لە ئێمە نەپاڕابێتەوە تا ناخۆشی و زیانێک کە تووشی بووە لێی دوور بخەینەوە، ئا بەو شێوەیە بۆ لە سنوور دەرچووان ئەو کارو کردەوانەی کە دەیانکرد رازێنراوەتەوە.

(١٣) سوێند بەخوا بێگومان ئێمە لە سەدەکانی پێش ئێوەدا خەڵکێکی زۆرمان لەناو بردووە کاتێک ستەمیان کردوە و رۆچوون تیایدا، لەکاتێکیشدا پێغەمبەرەکانیان بە بەڵگەی زۆرەوە بۆ هات و (پەیامی خوایان پێ راگەیاندن) وەنەبوو باوەڕیشیان پێبهێنن، (ئێمەش تۆڵەمان لێسەندن) تا بەو شێوەیە تۆڵە لە قەوم و گەلانی تاوانبار دەکەینەوە.

(١٤) پاشان ئێمە ئێوەمان کردە جێنشین لە زەویدا لەدوای لەناوبردنی ئەوان، تا ببینین ئێوە چی دەکەن و چۆن دەکەن!

وَإِذَا تُتْلَىٰ عَلَيْهِمْ ءَايَاتُنَا بَيِّنَٰتٍ قَالَ ٱلَّذِينَ لَا يَرْجُونَ
لِقَآءَنَا ٱئْتِ بِقُرْءَانٍ غَيْرِ هَٰذَآ أَوْ بَدِّلْهُ قُلْ مَا يَكُونُ لِىٓ
أَنْ أُبَدِّلَهُۥ مِن تِلْقَآئِ نَفْسِىٓ إِنْ أَتَّبِعُ إِلَّا مَا يُوحَىٰٓ إِلَىَّ إِنِّىٓ
أَخَافُ إِنْ عَصَيْتُ رَبِّى عَذَابَ يَوْمٍ عَظِيمٍ ﴿١٥﴾ قُل لَّوْ شَآءَ
ٱللَّهُ مَا تَلَوْتُهُۥ عَلَيْكُمْ وَلَآ أَدْرَىٰكُم بِهِۦ فَقَدْ لَبِثْتُ
فِيكُمْ عُمُرًا مِّن قَبْلِهِۦٓ أَفَلَا تَعْقِلُونَ ﴿١٦﴾ فَمَنْ أَظْلَمُ
مِمَّنِ ٱفْتَرَىٰ عَلَى ٱللَّهِ كَذِبًا أَوْ كَذَّبَ بِـَٔايَٰتِهِۦٓ إِنَّهُۥ
لَا يُفْلِحُ ٱلْمُجْرِمُونَ ﴿١٧﴾ وَيَعْبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ
مَا لَا يَضُرُّهُمْ وَلَا يَنفَعُهُمْ وَيَقُولُونَ هَٰٓؤُلَآءِ شُفَعَٰٓؤُنَا
عِندَ ٱللَّهِ قُلْ أَتُنَبِّـُٔونَ ٱللَّهَ بِمَا لَا يَعْلَمُ فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَلَا
فِى ٱلْأَرْضِ سُبْحَٰنَهُۥ وَتَعَٰلَىٰ عَمَّا يُشْرِكُونَ ﴿١٨﴾ وَمَا كَانَ
ٱلنَّاسُ إِلَّآ أُمَّةً وَٰحِدَةً فَٱخْتَلَفُوا۟ وَلَوْلَا كَلِمَةٌ
سَبَقَتْ مِن رَّبِّكَ لَقُضِىَ بَيْنَهُمْ فِيمَا فِيهِ يَخْتَلِفُونَ
﴿١٩﴾ وَيَقُولُونَ لَوْلَآ أُنزِلَ عَلَيْهِ ءَايَةٌ مِّن رَّبِّهِۦ فَقُلْ إِنَّمَا
ٱلْغَيْبُ لِلَّهِ فَٱنتَظِرُوٓا۟ إِنِّى مَعَكُم مِّنَ ٱلْمُنتَظِرِينَ ﴿٢٠﴾

(١٥) کاتێکیش ئایەتەکانی ئێمە کە روون و ئاشکرایە بەسەریاندا بخوێنرێتەوە، ئەوە ئەوانەی کە بەتەمانین ئامادەی بەردەم بارەگای ئێمە ببن دەڵێن: قورئانێکی جگە لەمە بهێنە و بیخوێنەرەوە، یان بیگۆڕە (بەشێوەیەکی تر)، تۆیش ئەی محمد ﷺ پێیان بڵێ: من بۆم نیە لە خۆمەوە بیگۆڕم، من شوێنی هیچ شتێک ناکەوم جگە ئەوە نەبێت کە بەوەحی پێم دەگات، بەڕاستی من دەترسم ئەگەر یاخی بم لە پەروەردگارم و نافەرمانی بکەم گیرۆدەی سزایەکی سەختی رۆژێکی زۆر گەورە ببم.

(١٦) پێیان بڵێ (ئەی پێغەمبەر ﷺ) ئەگەر خوا بیویستایە ئەوە قورئانم بەسەردا نەدەخوێندنەوە، خوایش ئاگاداری نەدەکردن پێی، چونکە بەڕاستی ئاشکرایە کە من تەمەنێکی دوورو درێژم لەناوتاندا بەسەر بردووە پێش هاتنی قورئان (بێ ئەوەی وشەیەک لەم قورئانە بزانم) کەواتە بۆچی عەقڵ و بیرو هۆشتان ناخەنە کار (کەسێکی نەخوێندەوار تا تەمەنی چلساڵی هیچ نەڵێت، بەمەرجێک ناو بانگی دەرکردبێت بەڕاستگۆیی و ئەمینداری، کەچی لەو تەمەنە بەدواوە ئەم قورئانە رێک و پێکە رابگەیەنێت، ئایا رەوا نیە هەر کەس دەیبیستێت خێرا بڕوا بهێنێت بەنێرەری قورئان و ئەو کەسەش کە بۆی رەوانە کراوە؟)

(١٧) جا کێ لەوە ستەمکارترە کە درۆ بەدەم خواوە هەڵدەبەستێت، یاخود ئایاتەکانی بەدرۆ بزانێت و بڕوای پێی نەبێت، بەڕاستی تاوانباران سەرفراز نابن.

(١٨) (بێباوەڕان وخوانەناسان) شتێک دەپەرستن لەجیاتی خوا نەزیانیان پێدەگەیەنێت نەقازانج، دەشڵێن: ئائەو بت و شتانە تکا کارمانن لای خوا، پێیان بڵێ ئەی محمد ﷺ: باشە ئایا ئێوە خوا ئاگادار دەکەنەوە بەشتێک کە لە ئاسمانەکان و لە زەویدا هەبێت و خوا نەیزانێت؟! پاک و بێگەردە و بەرزو بڵندە و دوورە لەوەی کە نەفامان دەیکەن بەهاوەڵی.

(١٩) خەڵکی لە سەرەتای پەیدا بوونیاندا بەش بەش نەبوون بەڵکو تەنها یەک پارچە بوون، یەک ئاین بوون، یەک بیرو باوەڕ بوون، جا کە (زەمان تێپەڕی و زۆر بوون و لە سەرچاوەی نووری پێغەمبەرایەتی دوورکەوتنەوە) ناکۆکی و جیاوازی لە نێوانیاندا پەیدابوو بەش بەش بوون، خۆ ئەگەر بڕیاردادەی پێشتر لەلایەن پەروەردگارتەوە نەبوایە، ئەوە دادپەروەری هەر لە دنیادا لە نێوانیاندا ئەنجامدەدرا، (حەق و راستی روون دەکرایەوە) لەو شتانەدا کە کێشە و جیاوازی تێدا دەکەن.

(٢٠) (هەروەها بێ باوەڕان) دەڵێن: بۆ موعجیزە و بەڵگەیەک دانەبەزێنرایە سەری لەلایەن پەروەردگاریەوە، ئەوە لەوەلامیاندا بڵێ: بەڕاستی موعجیزەو نهێنی و شاراوەکان تەنها بەدەست خوایە، جا ئێوە چاوەڕوانی بکەن، بێگومان منیش لەگەڵتاندا لە چاوەڕوانانم.

وَإِذَآ أَذَقۡنَا ٱلنَّاسَ رَحۡمَةٗ مِّنۢ بَعۡدِ ضَرَّآءَ مَسَّتۡهُمۡ إِذَا لَهُم مَّكۡرٞ فِيٓ ءَايَاتِنَاۚ قُلِ ٱللَّهُ أَسۡرَعُ مَكۡرًاۚ إِنَّ رُسُلَنَا يَكۡتُبُونَ مَا تَمۡكُرُونَ ﴿٢١﴾ هُوَ ٱلَّذِي يُسَيِّرُكُمۡ فِي ٱلۡبَرِّ وَٱلۡبَحۡرِۖ حَتَّىٰٓ إِذَا كُنتُمۡ فِي ٱلۡفُلۡكِ وَجَرَيۡنَ بِهِم بِرِيحٖ طَيِّبَةٖ وَفَرِحُواْ بِهَا جَآءَتۡهَا رِيحٌ عَاصِفٞ وَجَآءَهُمُ ٱلۡمَوۡجُ مِن كُلِّ مَكَانٖ وَظَنُّوٓاْ أَنَّهُمۡ أُحِيطَ بِهِمۡ دَعَوُاْ ٱللَّهَ مُخۡلِصِينَ لَهُ ٱلدِّينَ لَئِنۡ أَنجَيۡتَنَا مِنۡ هَٰذِهِۦ لَنَكُونَنَّ مِنَ ٱلشَّٰكِرِينَ ﴿٢٢﴾ فَلَمَّآ أَنجَىٰهُمۡ إِذَا هُمۡ يَبۡغُونَ فِي ٱلۡأَرۡضِ بِغَيۡرِ ٱلۡحَقِّۗ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِنَّمَا بَغۡيُكُمۡ عَلَىٰٓ أَنفُسِكُمۖ مَّتَٰعَ ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَاۖ ثُمَّ إِلَيۡنَا مَرۡجِعُكُمۡ فَنُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمۡ تَعۡمَلُونَ ﴿٢٣﴾ إِنَّمَا مَثَلُ ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا كَمَآءٍ أَنزَلۡنَٰهُ مِنَ ٱلسَّمَآءِ فَٱخۡتَلَطَ بِهِۦ نَبَاتُ ٱلۡأَرۡضِ مِمَّا يَأۡكُلُ ٱلنَّاسُ وَٱلۡأَنۡعَٰمُ حَتَّىٰٓ إِذَآ أَخَذَتِ ٱلۡأَرۡضُ زُخۡرُفَهَا وَٱزَّيَّنَتۡ وَظَنَّ أَهۡلُهَآ أَنَّهُمۡ قَٰدِرُونَ عَلَيۡهَآ أَتَىٰهَآ أَمۡرُنَا لَيۡلًا أَوۡ نَهَارٗا فَجَعَلۡنَٰهَا حَصِيدٗا كَأَن لَّمۡ تَغۡنَ بِٱلۡأَمۡسِۚ كَذَٰلِكَ نُفَصِّلُ ٱلۡأٓيَٰتِ لِقَوۡمٖ يَتَفَكَّرُونَ ﴿٢٤﴾ وَٱللَّهُ يَدۡعُوٓاْ إِلَىٰ دَارِ ٱلسَّلَٰمِ وَيَهۡدِي مَن يَشَآءُ إِلَىٰ صِرَٰطٖ مُّسۡتَقِيمٖ ﴿٢٥﴾

(٢١) کاتێکیش خەڵکی لە دوای ناخۆشیەک کە بۆیان پێش دێت لە رەحمەت و بەخششی خۆمان بەهرەوەریان دەکەین، ئەوە یەکسەر پیلانگێڕی کاریانە دژ بە ئاین و فەرمانەکانی ئێمە، ئەی محمد ﷺ پێیان بڵێ: خوا خێراترە لەوان لە نەخشەو پلاندا، بەڕاستی فریشتەکانمان هەموو پیلان و فێڵێک کە دەیکەن تۆماری دەکەن.

(٢٢) (ئەی هاوەڵگەران)خوا ئەو زاتەیە کە لە وشکانی و دەریادا هاتوچۆتان پێدەکات، هەتا ئەو کاتەی کە لە کەشتیەکاندا دەبن و دەیانگوێزنەوە بەهۆی با و شەماڵێکی پاک و نارامەوە و هەمووان دڵخۆشن پێی، ئەوە بایەکی توندو بەهێز و سەخت بەرەو کەشتیەکە بێت و هەڵبکات، لە هەموو لایەکەوە شەپۆل بۆیان بێت، ئیتر وابزانن کە دەورە دراون و (ڕزگار بوونیان ئەستەمە، ئا لەو کاتەدا خەڵکەکە بەسۆزەوە) هاناو هاوار بۆ خوا دەبەن، دڵنیان خوا نەبێت کەس ناتوانێت فریایان بکەوێت، لەکاتێکدا بیرو باوەڕو ئاینیان بە تەواویی پاک و پوخت و یەکلایی دەکەنەوە بۆ خوا، بۆیە بە سۆزەوە دەڵێن: سوێند بە خوا ئەگەر لەم بەلایە، لەم تەنگانەیە، رزگارمان بکەیت، ئەوە بەڕاستی دەچینە ریزی سوپاسگوزارانەوە.

(٢٣) جاکاتێک خوا رزگاری کردن، خێرا ئەوان بە ناحەق دەست دەکەنەوە بەستەمکاری لە زەویدا، ئەی خەڵکینە: بەڕاستی ستەم کردنتان تەنها لەسەر خۆتان دەکەوێت و بەزیانی خۆتان تەواو دەبێت، ئێوە بەو ستەمکاریە خۆشی و رابواردنی ژیانی دنیاتان دەوێت، لەوەودوا گەڕانەوەتان هەر بۆ لای ئێمەیە و ئەوسا ئاگادارتان دەکەینەوە بەهەموو ئەو کارو کردەوانەی کە دەتانکرد.

(٢٤) بێگومان نموونەی ژیانی ئەم دنیایە، هەر لەو بارانە دەچێت لە ئاسمانەوە دامانباراندووە جا بەهۆیەوە رووەکی زەوی گەشە دەکات و بەیەکدا چوون (بەرو بوومی خۆی پێشکەش دەکات) لەو خۆراکانەی کە هەم خەڵکی و هەم ئاژەڵیش لێی دەخۆن، هەتا کاتێک وای لێ دێت زەوی، بەجوانی نەخش و نیگاری خۆی دەردەخات و خۆی دەڕازێنێتەوە، خەڵکەکەی واگومان دەبەن بەڕاستی هەمیشە دەسەلاتداری تەواون بەسەریدا (ئا لەوکاتەدا کە خەڵکی خراپ و غافڵن و دڵیان بەدنیا خۆشە و هەرچی گوناهو تاوانە دەیکەن) ئەوە فەرمانی ئێمەیان بۆ دەردەچێت لە شەودا یان لە رۆژدا، ئەوسا وەک کشتوکاڵی دروێنە کراوی لێ دەکەین، هەروەکو دوێنێ نەبووبێت، ئابەو شێوەیە ئایەتەکانی خۆمان روون دەکەینەوە بۆ کەسانێک بیر بکەنەوە و تێفکرن (وا دیارە رۆژێک دێت پێشکەوتنی زانستی دەگاتە ئاستێکی زۆربالا، خەڵکی ئەو سەردەمە زۆر غەرا دەبن، بەلام لە پڕێکدا خوا کۆتایی بەهەموو شتێک دەهێنێت).

(٢٥) خوای گەورەش بانگەواز دەکات بۆ بەهەشتی پڕ لە شادی و ئاشتی و ئاسایش، هەر کەسێک ئەو زاتە بیەوێت (خۆیشی هەوڵ بدات بۆ بەدەستهێنانی) رێنموویی دەکات بۆ رێگە و رێبازی راست و دروست.



۞ لِّلَّذِينَ أَحْسَنُوا الْحُسْنَىٰ وَزِيَادَةٌ ۖ وَلَا يَرْهَقُ وُجُوهَهُمْ قَتَرٌ وَلَا ذِلَّةٌ ۚ أُولَٰئِكَ أَصْحَابُ الْجَنَّةِ ۖ هُمْ فِيهَا خَالِدُونَ ﴿٢٦﴾ وَالَّذِينَ كَسَبُوا السَّيِّئَاتِ جَزَاءُ سَيِّئَةٍ بِمِثْلِهَا وَتَرْهَقُهُمْ ذِلَّةٌ ۖ مَّا لَهُم مِّنَ اللَّهِ مِنْ عَاصِمٍ ۖ كَأَنَّمَا أُغْشِيَتْ وُجُوهُهُمْ قِطَعًا مِّنَ اللَّيْلِ مُظْلِمًا ۚ أُولَٰئِكَ أَصْحَابُ النَّارِ ۖ هُمْ فِيهَا خَالِدُونَ ﴿٢٧﴾ وَيَوْمَ نَحْشُرُهُمْ جَمِيعًا ثُمَّ نَقُولُ لِلَّذِينَ أَشْرَكُوا مَكَانَكُمْ أَنتُمْ وَشُرَكَاؤُكُمْ ۚ فَزَيَّلْنَا بَيْنَهُمْ ۖ وَقَالَ شُرَكَاؤُهُم مَّا كُنتُمْ إِيَّانَا تَعْبُدُونَ ﴿٢٨﴾ فَكَفَىٰ بِاللَّهِ شَهِيدًا بَيْنَنَا وَبَيْنَكُمْ إِن كُنَّا عَنْ عِبَادَتِكُمْ لَغَافِلِينَ ﴿٢٩﴾ هُنَالِكَ تَبْلُو كُلُّ نَفْسٍ مَّا أَسْلَفَتْ ۚ وَرُدُّوا إِلَى اللَّهِ مَوْلَاهُمُ الْحَقِّ ۖ وَضَلَّ عَنْهُم مَّا كَانُوا يَفْتَرُونَ ﴿٣٠﴾ قُلْ مَن يَرْزُقُكُم مِّنَ السَّمَاءِ وَالْأَرْضِ أَمَّن يَمْلِكُ السَّمْعَ وَالْأَبْصَارَ وَمَن يُخْرِجُ الْحَيَّ مِنَ الْمَيِّتِ وَيُخْرِجُ الْمَيِّتَ مِنَ الْحَيِّ وَمَن يُدَبِّرُ الْأَمْرَ ۚ فَسَيَقُولُونَ اللَّهُ ۚ فَقُلْ أَفَلَا تَتَّقُونَ ﴿٣١﴾ فَذَٰلِكُمُ اللَّهُ رَبُّكُمُ الْحَقُّ ۖ فَمَاذَا بَعْدَ الْحَقِّ إِلَّا الضَّلَالُ ۖ فَأَنَّىٰ تُصْرَفُونَ ﴿٣٢﴾ كَذَٰلِكَ حَقَّتْ كَلِمَتُ رَبِّكَ عَلَى الَّذِينَ فَسَقُوا أَنَّهُمْ لَا يُؤْمِنُونَ ﴿٣٣﴾

(٢٦) بۆ ئەوانەی چاکەیان کردووە، پاداشتی چاکترو بەهەشتی بەرین و زیاتریش ئامادەیە بە چەندەها قات، (لە ریوایەتێکدا کە پێشەوایان ئەحمەدو موسلیم ریوایەتیان کردووە، ئەو زیادەیە، تەماشا کردنی روخساری پڕ لە نوورو قەشەنگی زاتی پەروەردگارە) رووخساریشیان رەشی و تالی و ریسوایی و زەلیلی و ماندوێتی پێوە دیارنیە، ئا ئەوانە نیشتەجێی بەهەشتن و بۆ هەمیشە ژیانی تیادا دەبەنەسەر.

(٢٧) ئەوانەش گوناهو تاوانەکانیان ئەنجامداوە، هەرچەندە پاداشتی هەر گوناهو تاوانێک بە قەدەر خۆی دەدرێتەوە (بەڵام هەندێک ئەوەندە تاوانبارن) خەجاڵەتی و سەرشۆڕی و روو رەشی ماندووی کردوون، کەس نیە پەنایان بدات و بیانپارێزێت لە (خەشم و قینی) خوا، ئەوەندە روو رەشن هەر دەڵێی پارچەیەک لە شەوی تاریک روخساری داپۆشیوون، ئائەوانە نیشتەجێی ناوئاگری دۆزەخن و بۆ هەمیشە ژیان لە ناویدا دەبەنە سەر.

(٢٨) ئەمانەش لە رۆژێکدا دەبێت کە هەر هەموو خەڵکی کۆدەکەینەوە بۆ لێپرسینەوە، پاشان بەوانە دەڵێین: کە شەریک و هاوەڵیان بۆ خوا بڕیارداوە: خۆتان و ئەو شتانەی کە دەتانپەرست، لە جێی خۆتان بوەستن و مەجوڵێن، ئەوسا موشریکەکان لە پەرستراوەکانیان جیا دەکەینەوە، خوا بت و پەرستراوەکان، دەهێنێتە قسە و ئەوانیش بەیەک دەنگ دەڵێن: ئێوە ئێمەتان نەئەپەرست!!

(٢٩) ئینجا خوا بەسە کە شایەت بێت لە نێوان ئێمە و ئێوەدا، بەراستی ئێمە ئاگاداری پەرستن و پاڕانەوەی ئێوە نەبووین.

(٣٠) ئا لەوێدا (لە گۆڕەپانی مەحشەرو لێپرسینەوەدا) هەموو کەس دەرئەنجامی کاروکردەوەی رابووردووی هەست پێ دەکات کە پێش خۆی رەوانەی کردووە، ئەوسا هەمووان دەگەڕێنرێنەوە بۆ لای خوا، خاوەنی راستەقینە و پەروەردگاری حەق، هەر چیەکیش بەناحەق دەیانپەرست و هەڵیاندەبەست و پێی هەڵخەڵەتاو بوون، ون دەبێت و لەناو دەچێت..

(٣١) (ئەی پێغەمبەر ﷺ پێیان بڵێ): کێ هەیە لەئاسمانەوە (بەهۆی تیشکی خۆرو بارانەوە) و لە زەویەوە (بەهۆی خاک و ئاوو هەواوە) رزق و رۆزیتان بۆ فەراهەم بهێنێت و پێتان ببەخشێت، ئەی کێ هەیە خاوەنی دەزگاکانی بیستن وبینین بێت (توانای بیستن و بینینان پێ ببەخشێت) ئەی کێ زیندوو لەمردوو دەردەهێنێت و مردوو لە زیندوو دەردەهێنێت، هەروەها کێیە کە هەموو کارو فەرمانەکان جێبەجێ دەکات و گۆڕانکاریان بەسەردا دەهێنێت (لە بەرامبەر هەموو ئەو پرسیارانەوە) خەڵکی دەڵێن: الله، خوا (هەموو ئەو کارانە و زیاتریش زۆر بەئاسانی ئەنجام دەدات لە رێگەی یاساو بەرنامەیەکەوە کە هەر خۆی دایڕشتووە)، کەواتە پێیان بڵێ: ئایا ناترسن لە سەرەنجامی یاخی بوونتان، ئایا ناترسن لە خەشم و قینی خوا؟!

(٣٢) جا هەر ئەو زاتەیە پەروەردگاری راست و دروستتان، (باشە) دوای حەق و راستی چی هەیە جگە لەگومڕایی و سەرگەردانی؟ (ئیتر ئێوە بۆ بیرناکەنەوە) چۆن لادەدرێن (لە رێبازی حەقەوە بۆ رێبازی بەتاڵ)؟!

(٣٣) ئا بەو شێوەیە (چونکە لەگەڵ ئەو هەموو بەڵگەیەدا هەر تاوانبارن و سەرکەشی دەکەن) بڕیاری پەروەردگارت لەسەر ئەوانەی کە لە سنوور دەرچوون بڕاوەتەوە، کە ئەوانە بەراستی هەر ئیمان و باوەڕناهێنن.

قُلْ هَلْ مِن شُرَكَآئِكُم مَّن يَبْدَؤُا۟ ٱلْخَلْقَ ثُمَّ يُعِيدُهُۥ ۚ قُلِ ٱللَّهُ يَبْدَؤُا۟ ٱلْخَلْقَ ثُمَّ يُعِيدُهُۥ ۖ فَأَنَّىٰ تُؤْفَكُونَ ﴿٣٤﴾ قُلْ هَلْ مِن شُرَكَآئِكُم مَّن يَهْدِىٓ إِلَى ٱلْحَقِّ ۚ قُلِ ٱللَّهُ يَهْدِى لِلْحَقِّ ۗ أَفَمَن يَهْدِىٓ إِلَى ٱلْحَقِّ أَحَقُّ أَن يُتَّبَعَ أَمَّن لَّا يَهِدِّىٓ إِلَّآ أَن يُهْدَىٰ ۖ فَمَا لَكُمْ كَيْفَ تَحْكُمُونَ ﴿٣٥﴾ وَمَا يَتَّبِعُ أَكْثَرُهُمْ إِلَّا ظَنًّا ۚ إِنَّ ٱلظَّنَّ لَا يُغْنِى مِنَ ٱلْحَقِّ شَيْـًٔا ۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمٌۢ بِمَا يَفْعَلُونَ ﴿٣٦﴾ وَمَا كَانَ هَٰذَا ٱلْقُرْءَانُ أَن يُفْتَرَىٰ مِن دُونِ ٱللَّهِ وَلَٰكِن تَصْدِيقَ ٱلَّذِى بَيْنَ يَدَيْهِ وَتَفْصِيلَ ٱلْكِتَٰبِ لَا رَيْبَ فِيهِ مِن رَّبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٣٧﴾ أَمْ يَقُولُونَ ٱفْتَرَىٰهُ ۖ قُلْ فَأْتُوا۟ بِسُورَةٍ مِّثْلِهِۦ وَٱدْعُوا۟ مَنِ ٱسْتَطَعْتُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ ﴿٣٨﴾ بَلْ كَذَّبُوا۟ بِمَا لَمْ يُحِيطُوا۟ بِعِلْمِهِۦ وَلَمَّا يَأْتِهِمْ تَأْوِيلُهُۥ ۚ كَذَٰلِكَ كَذَّبَ ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ ۖ فَٱنظُرْ كَيْفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٣٩﴾ وَمِنْهُم مَّن يُؤْمِنُ بِهِۦ وَمِنْهُم مَّن لَّا يُؤْمِنُ بِهِۦ ۚ وَرَبُّكَ أَعْلَمُ بِٱلْمُفْسِدِينَ ﴿٤٠﴾ وَإِن كَذَّبُوكَ فَقُل لِّى عَمَلِى وَلَكُمْ عَمَلُكُمْ ۖ أَنتُم بَرِيٓـُٔونَ مِمَّآ أَعْمَلُ وَأَنَا۠ بَرِىٓءٌ مِّمَّا تَعْمَلُونَ ﴿٤١﴾ وَمِنْهُم مَّن يَسْتَمِعُونَ إِلَيْكَ ۚ أَفَأَنتَ تُسْمِعُ ٱلصُّمَّ وَلَوْ كَانُوا۟ لَا يَعْقِلُونَ ﴿٤٢﴾

(٣٤) (ئەی محمد ﷺ) پێیان بڵێ: باشە ئایا لەو شتانەی کە ئێوە لەجیاتی خوا (دەیپەرستن) کەسێک هەیە کە بتوانێت شتێک دروست بکات لە سەرەتاوە، یان ئەگەر دروستی کردوو دوایی نەما، ئایا دەتوانێت سەرلەنوێ بیهێنێتەوە کایە؟! ئەی پێغەمبەر ﷺ تۆ بڵێ: هەرخوا، ﷲ، هەر ئەو دەتوانێت لە سەرەتاو نەبوونەوە خەڵکی و هەمووشت دروست بکات و پاشان دوای مردن و نەمان دووبارەی بکاتەوە، کەوابوو چۆن لادەدرێن لە حەق بەهۆی درۆو پروپاگەندەوە؟!

(٣٥) هەروەها پێیان بڵێ: ئایا کەسێک یان شتێک هەیە لە پەرستراوەکانتان، هیدایەت و ڕێنموویی بکات بۆ ڕێبازی حەق و ڕاستی (بێگومان نەخێر) دەی پێیان بڵێ: خوا ڕێنموویی بۆ حەق و ڕاستی دەکات، جا ئایا کەسێک ڕێنموویی بکات بۆ حەق و ڕاستی شایستەترە کە پەیڕەوی بکرێ یان کەسێک ڕێنموویی وەرناگرێت مەگەر ڕێنموویی بکرێ؟ ئەوە چیتانە چۆن بڕیاری وا دەدەن؟ فەرمانی وا دەردەکەن؟

(٣٦) زۆربەیان شوێنی هیچ شتێک ناکەون تەنها گومان نەبێت، بەڕاستی گومانیش هیچ سوودێک بەخاوەنەکەی ناگەیەنێت لەبارەی حەق و ڕاستییەوە، بەڕاستی خوا زانایە بە هەموو ئەو کارو کردەوانەی کە ئەنجامی دەدەن.

(٣٧) وەنەبێت ئەم قورئانە لەلایەن کەسێکەوە دارێژرا بێت و هەڵبەسترابێت جگە لە خوا، بەڵکو ڕاستی و ڕەوانی کتێبە ئاسمانیەکانی پێش خۆیشی دووپات دەکاتەوە، هەروەها ڕوون کەرەوەی بیرو باوەڕو ئەرکەکانە، بەڕاستی هیچ گومان لەوەدا نیە کە ئەم قورئانە لەلایەن پەروەردگاری هەموو جیهانەوە ڕەوانە کراوە.

(٣٨) بەڵکو (لەگەڵ ئەو هەموو بەڵگانەدا) ئەوانە دەڵێن کە محمد ﷺ قورئانی هەڵبەستووە، بڵێ: دەتێوەش سوورەتێک وەک سوورەتەکانی دارێژن و بیهێنن، داوا بکەن لەهەر کەسێکی تر کە دەتوانن جگە لە خوا (کە یارمەتیتان بدات) درێغی مەکەن ئەگەر ڕاستگۆن.

(٣٩) بەڵکو سەرەڕای ئەو هەموو بەڵگانە ئەوانە بڕوایان بە قورئان نەکردووە کە هیچ شتێکیان نەزانیووە دەربارەی، هێشتا بۆیان نەهاتووە سەرەنجامی ئەو بەڵێنانەی کە بەڵێنی پێدراون، هەر بەو شێوەیە ئەوانەی پێش ئەمان بەرنامەی خوایان بە درۆزانی و بڕوایان پێی نەبوو، دە تەماشا بکە و سەرنج بدە بزانە سەرەنجامی ستەمکاران چۆن بووە.

(٤٠) لەو خەڵکەدا کەسانێک هەن ئیمان و باوەڕ بەقورئان ئەهێنن و هەشیانە ئیمان و باوەڕی پێناهێنێت، پەروەردگاری تۆیش هەمیشە ئاگادارە بەوانەی کە تۆوی خراپە دەچێنن.

(٤١) ئەگەر بڕواشیان پێنەکردیت و بەرنامەکەی تۆیان بەدرۆزانی، ئەوە تۆش بڵێ: کارو کردەوەی خۆم هەر بۆ خۆمە و کارو کردەوەی خۆتان هەر بۆ خۆتانە، ئێوە بەرین و لێپرسراو نین لە هەرچی من دەیکەم، منیش بەریم و لێپرسراو نیم لە هەرچی کە ئێوە دەیکەن.

(٤٢) (لەو بێ باوەڕانە) کەسانێک هەیە گوێت بۆ هەڵدەخات (کاتێک قورئان دەخوێنیت)، جا ئایا تۆ دەتوانیت قسە و گوفتاری خۆت بدەی بەگوێی کەسانێکدا کە کەڕەواڵەن نابیستن و ئەگەر چی تێ نەنەگەیشتن و عەقڵ و ژیریان نەدەخستەکار.

وَمِنْهُم مَّن يَنظُرُ إِلَيْكَ ۚ أَفَأَنتَ تَهْدِي الْعُمْيَ وَلَوْ كَانُوا لَا يُبْصِرُونَ ﴿٤٣﴾ إِنَّ اللَّهَ لَا يَظْلِمُ النَّاسَ شَيْئًا وَلَٰكِنَّ النَّاسَ أَنفُسَهُمْ يَظْلِمُونَ ﴿٤٤﴾ وَيَوْمَ يَحْشُرُهُمْ كَأَن لَّمْ يَلْبَثُوا إِلَّا سَاعَةً مِّنَ النَّهَارِ يَتَعَارَفُونَ بَيْنَهُمْ ۚ قَدْ خَسِرَ الَّذِينَ كَذَّبُوا بِلِقَاءِ اللَّهِ وَمَا كَانُوا مُهْتَدِينَ ﴿٤٥﴾ وَإِمَّا نُرِيَنَّكَ بَعْضَ الَّذِي نَعِدُهُمْ أَوْ نَتَوَفَّيَنَّكَ فَإِلَيْنَا مَرْجِعُهُمْ ثُمَّ اللَّهُ شَهِيدٌ عَلَىٰ مَا يَفْعَلُونَ ﴿٤٦﴾ وَلِكُلِّ أُمَّةٍ رَّسُولٌ ۖ فَإِذَا جَاءَ رَسُولُهُمْ قُضِيَ بَيْنَهُم بِالْقِسْطِ وَهُمْ لَا يُظْلَمُونَ ﴿٤٧﴾ وَيَقُولُونَ مَتَىٰ هَٰذَا الْوَعْدُ إِن كُنتُمْ صَادِقِينَ ﴿٤٨﴾ قُل لَّا أَمْلِكُ لِنَفْسِي ضَرًّا وَلَا نَفْعًا إِلَّا مَا شَاءَ اللَّهُ ۗ لِكُلِّ أُمَّةٍ أَجَلٌ ۚ إِذَا جَاءَ أَجَلُهُمْ فَلَا يَسْتَأْخِرُونَ سَاعَةً ۖ وَلَا يَسْتَقْدِمُونَ ﴿٤٩﴾ قُلْ أَرَأَيْتُمْ إِنْ أَتَاكُمْ عَذَابُهُ بَيَاتًا أَوْ نَهَارًا مَّاذَا يَسْتَعْجِلُ مِنْهُ الْمُجْرِمُونَ ﴿٥٠﴾ أَثُمَّ إِذَا مَا وَقَعَ آمَنتُم بِهِ ۚ آلْآنَ وَقَدْ كُنتُم بِهِ تَسْتَعْجِلُونَ ﴿٥١﴾ ثُمَّ قِيلَ لِلَّذِينَ ظَلَمُوا ذُوقُوا عَذَابَ الْخُلْدِ هَلْ تُجْزَوْنَ إِلَّا بِمَا كُنتُمْ تَكْسِبُونَ ﴿٥٢﴾ ۞ وَيَسْتَنبِئُونَكَ أَحَقٌّ هُوَ ۖ قُلْ إِي وَرَبِّي إِنَّهُ لَحَقٌّ ۖ وَمَا أَنتُم بِمُعْجِزِينَ ﴿٥٣﴾



(٤٣) هەشیانە سەرنجی تۆ دەدات و لـە هـەڵس و کەوت و گوفتارو رەفتاری تۆ ورد دەبێتەوە، جا ئایا تۆ هیدایـەتی کوێـرو نابینایـان دەدەیـت؟! ئەگـەر کوێراییان داهـاتبێت و نـەبینن؟! (دیارەکـە ئەوانـە دڵیان کوێرەو دەروونیان تاریکە و ئایانەوێت نـووری ئیسلام دڵ و دەروونیان رووناک بکاتەوە).

(٤٤) بـەڕاستی خوا هیچ جۆرە ستەمێک ناکات لە خـەڵکی، بـەڵکو خـەڵکی خۆیـان ستەم لـە خۆیـان دەکەن.

(٤٥) رۆژێـک دێت خـوا هــەر هـەموانیان کـۆ دەکاتەوە، وا هەسـت دەکـەن تەنها سـەعاتێک لـە رۆژیـان پێچـووە (خزمـان و ناسـیاوان) هـەموان یـەکتر دەناسنەوە، بێگومـان ئەوانـەی کە بڕوایـان نـەبوو بـە ئامادە بوونـی بـەردەم دادگـای خـوا، خسارەتمەندی و زەرەرمەندیـەکی زۆر روویـان تـێ دەکات، بەڕاستی ئەوانە هیدایەت وەرگر نەبوون.

(٤٦) خۆ ئەگەر هـەندێ لـە هەڕەشـەکانی خۆمـان (بۆخوانەناسان) پێش بهێنین و نیشانی تۆی بدەین، یاخود پێشتر گیانت بکێشین و ناکامیان نـەبینیت، ئەوە گەڕانەوەیان هەر بۆ لای ئێمەیە (لە دەسـتمان دەرباز نابن)، لەوەودواش خوا خۆی شـایەتە لەسـەر هەموو ئەو کارو کردەوانەی کە ئەنجامی دەدەن.

(٤٧) بـۆ هـەموو قـەوم و گـەلێک پێغەمبـەرێک هەبووە، جا کاتێک (لە گۆڕەپانی مەحشەردا) ئـەو پێغەمبـەرەیان ئامادە دەبێت، لەسـەر بنچینـەی دادپەروەری داوەری دەکرێت لە نێوانیاندا و هیچ جۆرە ستەمێکیان لێناکرێت.

(٤٨) (بێباوەڕان) دەڵێن: کوا، کەی ئەو بەڵێنە پێش دێت؟ کەی رۆژی قیامەت بەرپا دەبێت؟! ئەگەر ئێوە راست دەکەن!

(٤٩) پێیان بڵێ (من تەنها پێغەمبەرم) توانای ئەوەشم بەدەست نیە کە زەرەرێک یان قازانجێک بـەخۆم بگەیـەنم مەگـەر ئەوەی کە ویستی خـوای لـەسەر بێت، هەموو قەومێک کـاتی دیـاری کـراوی خـۆی هەیە بـۆ کۆتایی هـاتنی، هـەر کـاتێک ئەوساتە گەیشت، ئەوە ئەتاوێک دوا دەکەون، ئەساتێکیش پێش دەکەون.

(٥٠) بڵێ: هـەواڵـم بـدەنێ بـاشـە ئـەگـەر سـزاو تـۆڵـەی خـوا لـە شـەوگـاردا یـان لـە رۆژگـاردا یـەخـەی پێـگرتن، تاوانباران (بەتەمای چین؟) ئاخۆ بۆچی پەلە دەکەن؟!

(٥١) دوای ئەوە ئایا کە (قیامەت) روویداو بەرپا بوو باوەڕی پێ دەهێنن؟! ئەوسا پێیان دەوترێت: ئا ئێستە بـاوەڕی پـێ دەهێنن؟! خۆ بەڕاستی کاتی خۆی (بەگاڵتە پێکردنەوە) پەلەتان دەکرد لە پێشهاتنی و (بڕواتان پێی نەبوو)!

(٥٢) ئەوسا بەوانەی کە ستەمیان لە خۆیان کرد دەوترێت: دە بچێژن سزاو ئازاری ئەبڕاوە، مەگەر پاداشـتان لـە بەرامبـەری کارو کردەوە و هەوڵەکانی خۆتانەوە نادرێتەوە کە دەتانکرد؟!

(٥٣) (بێ باوەڕان بەگاڵتەوە لێت دەپرسن): ئایا بەرپابوونی قیامەت راستە؟ (شتی وا پێش دێـت؟!). بڵـێ: بـەڵێ، راسـتە، سوێند بەپەروەردگارم بەڕاستی ئەوە حەقیقەتێکە و (هەر پێش دێت و) ئێوە ناتوانن خوا دەستەوسان بکەن.

وَلَوْ أَنَّ لِكُلِّ نَفْسٍ ظَلَمَتْ مَا فِي الْأَرْضِ لَافْتَدَتْ بِهِ ۗ وَأَسَرُّوا النَّدَامَةَ لَمَّا رَأَوُا الْعَذَابَ ۖ وَقُضِيَ بَيْنَهُم بِالْقِسْطِ ۚ وَهُمْ لَا يُظْلَمُونَ ﴿٥٤﴾ أَلَا إِنَّ لِلَّهِ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ ۗ أَلَا إِنَّ وَعْدَ اللَّهِ حَقٌّ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَهُمْ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٥٥﴾ هُوَ يُحْيِي وَيُمِيتُ وَإِلَيْهِ تُرْجَعُونَ ﴿٥٦﴾ يَا أَيُّهَا النَّاسُ قَدْ جَاءَتْكُم مَّوْعِظَةٌ مِّن رَّبِّكُمْ وَشِفَاءٌ لِّمَا فِي الصُّدُورِ وَهُدًى وَرَحْمَةٌ لِّلْمُؤْمِنِينَ ﴿٥٧﴾ قُلْ بِفَضْلِ اللَّهِ وَبِرَحْمَتِهِ فَبِذَٰلِكَ فَلْيَفْرَحُوا هُوَ خَيْرٌ مِّمَّا يَجْمَعُونَ ﴿٥٨﴾ قُلْ أَرَأَيْتُم مَّا أَنزَلَ اللَّهُ لَكُم مِّن رِّزْقٍ فَجَعَلْتُم مِّنْهُ حَرَامًا وَحَلَالًا قُلْ آللَّهُ أَذِنَ لَكُمْ ۖ أَمْ عَلَى اللَّهِ تَفْتَرُونَ ﴿٥٩﴾ وَمَا ظَنُّ الَّذِينَ يَفْتَرُونَ عَلَى اللَّهِ الْكَذِبَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ ۗ إِنَّ اللَّهَ لَذُو فَضْلٍ عَلَى النَّاسِ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَهُمْ لَا يَشْكُرُونَ ﴿٦٠﴾ وَمَا تَكُونُ فِي شَأْنٍ وَمَا تَتْلُو مِنْهُ مِن قُرْآنٍ وَلَا تَعْمَلُونَ مِنْ عَمَلٍ إِلَّا كُنَّا عَلَيْكُمْ شُهُودًا إِذْ تُفِيضُونَ فِيهِ ۚ وَمَا يَعْزُبُ عَن رَّبِّكَ مِن مِّثْقَالِ ذَرَّةٍ فِي الْأَرْضِ وَلَا فِي السَّمَاءِ وَلَا أَصْغَرَ مِن ذَٰلِكَ وَلَا أَكْبَرَ إِلَّا فِي كِتَابٍ مُّبِينٍ ﴿٦١﴾

(٥٤) ئەگەر هەرچی لە زەویدا هەیە کەسێک کە ستەمی کردووە خاوەنی بێت (لە قیامەتدا) ئامادەیە هەر هەمووی بکاتە قوربانی خۆی و بیبەخشێت، ئەوانە لە دەروونەوە زۆر پەشیمانن کاتێک سزاو ئازاری چاوەڕوان نەکراو دەبینن، ئەوسا داوەری لە نێوانیاندا لەسەر بنچینەی دادپەروەری ئەنجام دەدرێت و ئەوانە هیچ جۆرە ستەمێکیان لێناکرێت.

(٥٥) (خەڵکینە) ئاگاداربن و بیرتان نەچێت کە بەڕاستی هەرچی لە ئاسمانەکان و زەویدا هەیە هەر هەمووی بۆ خوایە، ئاگاداربن کە بەڵێنی خوا راست و دروستە (قیامەت بەرپا دەکات و پاداشت و سزا لەسەر بنچینەی ئیمان و کردەوە دیاری دەکات) بەڵام زۆربەی خەڵکی لەم راستیە بێ ئاگان و نایزانن.

(٥٦) هەرخوا ژیان دەبەخشێت و مردن پێش دەهێنێت، هەر بۆ لای ئەویش دەبرێنەوە.

(٥٧) ئەی خەڵکینە، بەڕاستی ئێوە ئامۆژگاریەکی گەورە و گرنگتان لەلایەن پەروەردگارتانەوە بۆ هاتووە کە(قورئانە) شیفا و چارەسەریشە بۆ نەخۆشی دڵ و دەروونەکان و رێ نیشاندەرو رەحمەتیشە بۆ ئیمانداران.

(٥٨) (ئەی محمد ﷺ) بە ئیمانداران بڵێ: با دڵشاد و شادمان بن بە فەزڵ و بەخشش و رەحمەتی خوایی (کە قورئان و بەرنامەی خوایە)، کەوابوو با هەر بەوە دڵخۆش بن، هەر ئەوەش چاکترە بۆیان لە هەموو ئەو شتانەی کە خەڵکی خەریکن کۆی دەکەنەوەو کەڵەکەی دەکەن.

(٥٩) بڵێ پێیان: هەواڵم بدەنێ، ئێوە چۆن لە خۆتانەوە ئەو رزق و رۆزیەی کە خوا پێی بەخشیوون دابەشی دەکەن و هەندێکی بەحەرام دادەنێن و هەندێکی بەحەلاڵ(کەچی باوەڕتان بە بەرنامەی خوا نیە)، پێیان بڵێ: ئایا خوا خۆی مۆڵەتی ئەوکارەی پێداون؟! یاخود لە خۆتانەوە شت بە دەم خواوە هەڵدەبەستن؟!

(٦٠) باشە، ئاخۆ لە رۆژی قیامەتدا گومان و بۆچوونی ئەوکەسانە چۆن بێت کە درۆ بەدەم خواوە هەڵدەبەستن؟ (ئایا وادەزانن لێ پرسینەوە نیە؟) بەڕاستی (لەگەڵ لاری زۆربەی خەڵکیدا) خوا هەر خاوەنی فەزڵە بەسەریانەوە، هەر چەندە زۆربەیان سوپاس ناپەزێرو بێ ئەمەکن.

(٦١) (ئەی پێغەمبەر ﷺ) تۆ بە هیچ کارێک هەڵناسی، هیچ بەشێک لە قورئان ناخوێنیتەوە (کە ئێمە ئاگادار نەبین، ئێوەش ئەی خەڵکینە) بەهیچ هەڵسوکەوتێک هەڵناسن کە ئێمە شایەت نەبین بەسەریەوە لەکاتێکدا ئەنجامی دەدەن و تیایدا رۆدەچن، هیچ شتێکیش لە پەروەردگاری تۆ، ون نابێت لە پارچە ئەتۆمێکەوە بگرە لە زەوی یان لە ئاسماندا، بچوکتر بێت یان گەورەتر، کە لە دۆسیەیەکی تایبەتی ئاشکرادا لای ئێمە تۆمار نەکرابێت.

أَلَآ إِنَّ أَوْلِيَآءَ ٱللَّهِ لَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ ﴿٦٢﴾ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَكَانُوا۟ يَتَّقُونَ ﴿٦٣﴾ لَهُمُ ٱلْبُشْرَىٰ فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا وَفِى ٱلْءَاخِرَةِ ۚ لَا تَبْدِيلَ لِكَلِمَٰتِ ٱللَّهِ ۚ ذَٰلِكَ هُوَ ٱلْفَوْزُ ٱلْعَظِيمُ ﴿٦٤﴾ وَلَا يَحْزُنكَ قَوْلُهُمْ ۘ إِنَّ ٱلْعِزَّةَ لِلَّهِ جَمِيعًا ۚ هُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْعَلِيمُ ﴿٦٥﴾ أَلَآ إِنَّ لِلَّهِ مَن فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَن فِى ٱلْأَرْضِ ۗ وَمَا يَتَّبِعُ ٱلَّذِينَ يَدْعُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ شُرَكَآءَ ۚ إِن يَتَّبِعُونَ إِلَّا ٱلظَّنَّ وَإِنْ هُمْ إِلَّا يَخْرُصُونَ ﴿٦٦﴾ هُوَ ٱلَّذِى جَعَلَ لَكُمُ ٱلَّيْلَ لِتَسْكُنُوا۟ فِيهِ وَٱلنَّهَارَ مُبْصِرًا ۚ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَٰتٍ لِّقَوْمٍ يَسْمَعُونَ ﴿٦٧﴾ قَالُوا۟ ٱتَّخَذَ ٱللَّهُ وَلَدًا ۗ سُبْحَٰنَهُۥ ۖ هُوَ ٱلْغَنِىُّ ۖ لَهُۥ مَا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِى ٱلْأَرْضِ ۚ إِنْ عِندَكُم مِّن سُلْطَٰنٍۭ بِهَٰذَآ ۚ أَتَقُولُونَ عَلَى ٱللَّهِ مَا لَا تَعْلَمُونَ ﴿٦٨﴾ قُلْ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَفْتَرُونَ عَلَى ٱللَّهِ ٱلْكَذِبَ لَا يُفْلِحُونَ ﴿٦٩﴾ مَتَٰعٌ فِى ٱلدُّنْيَا ثُمَّ إِلَيْنَا مَرْجِعُهُمْ ثُمَّ نُذِيقُهُمُ ٱلْعَذَابَ ٱلشَّدِيدَ بِمَا كَانُوا۟ يَكْفُرُونَ ﴿٧٠﴾

(٦٢) ئاگاداربن کە بەڕاستی چاکان و خۆشەویستانی خوای میهرەبان نەترس و بیم روویان تێدەکات (لە سەرەمەرگ و لە رۆژی لێ پرسینەوەدا)، نغـم و پەژارە و دڵتەنگی دایان دەگرێت (بەڵکو فریشتەکان بەروو خۆشییەوە مژدەی سەرفرازی و خۆشنوودیان دەدەنێ)...

(٦٣) (ئەو بەختەوەرانە) ئەو کەسانەن باوەڕی بەتین و دامەزراوو پرسۆزیان هێناوە بە پەروەردگاریان و خۆشیان دەپارێزن لە خەشم و قینی خوا (بەهۆی ئەنجامدانی فەرمانەکانی خوا و تەرێزکردنیان لە حەرام)...

(٦٤) هەر بۆ ئەوانە مژدەی (کامەرانی و بەختەوەری) لەژیانی دنیادا (کە مژدەی قورئان و فەرموودەیە) لە قیامەتیشدا (مژدەکان هەموو دەبنە واقع و، هەموو مژدە قورئانییەکان بە زیادەوە دێنە دی)، بێگومان ئەو بەڵێنانەی خوا هەر دێنەدی و هیچ گۆڕانێکیان بەسەردا نایەت، ئا ئەوەیە سەرفرازی و کامەرانی گەورەو مەزن.

(٦٥) گوفتاری نابەجێ و نادروستی خوانەناسان خەفەتبارو غەمگینت نەکات، چونکە بەڕاستی عیزەت و بەرزی و بڵندی هەر هەمووی هی خوایە، ئەو زاتە هەمیشە بیسەرو زانایە.

(٦٦) ئاگادار بن کە بەڕاستی هەر کەس لە ئاسمانەکان و لە زەویدا هەیە خوا خاوەنیانە، ئەوانەی جگە لە خوا شتی تر دەپەرستن و پەیڕەوی رێبازی تر دەکەن (وەنەبێت شوێن رێبازێکی چاک کەوتبن) ئەوانە تەنها شوێنی گومان کەوتوون، ئەوانە جگە لە درۆ کردن و گۆترەکاری هیچی تر ناکەن.

(٦٧) هەر زاتی خوایە کە شەوی بۆ بەدیهێناون تاوەکو تیایدا بحەوێنەوە، رۆژیشی کردووە بە رووناککەرەوە، (تا کارو کاسپی تیادا ئەنجام بدەن)، بەڕاستی ئا لەو دیاردانەدا بەڵگە و نیشانەی زۆر هەن (لەسەر دەسەڵات و توانایی پەروەردگار) بۆ کەسانێک کە ببیستن و تێبگەن.

(٦٨) (خوانەناسان) دەڵێن: خوا منداڵی بۆ خۆی بڕیارداوە! پاکی و بێگەردی شایستەی ئەو خوایەیە، ئەو زاتە بێ نیازە (پێویستی بە کوڕو کچ نیە)، هەرچی لە ئاسمانەکان و لە زەویدا هەیە هەر خوا خاوەنیانە، بێگومان هیچ بەڵگە و نیشانەیەکتان نیە بۆ ئەم بوختانە ناڕەوایە، ئایا شتێک هەڵدەبەستن بۆ خواو (بێ باکانە) دەیڵێن، کە هیچی لێ نازانن و هیچ بنەمایەکی نیە؟!

(٦٩) (ئەی پێغەمبەر ﷺ تۆ) بڵێ: بەڕاستی ئەوانەی درۆو بوختان بەدەم خواوە هەڵدەبەستن، ئەوە سەرفرازو رزگار نابن.

(٧٠) (بەڵکو هەموو دەسکەوتەکەیان) ژیانی دنیاو رابواردنی دنیایە، لەوەودوا گەڕانەوەیان بۆ لای ئێمەیە، ئەوسا سزای بە ئێشیان دەدەین و تاڵاو دەکەین بەگەروویاندا بەهۆی ئەوەی کە بێ باوەڕ ئەبوون پێی.



﴿ وَٱتْلُ عَلَيْهِمْ نَبَأَ نُوحٍ إِذْ قَالَ لِقَوْمِهِۦ يَٰقَوْمِ إِن كَانَ كَبُرَ عَلَيْكُم مَّقَامِى وَتَذْكِيرِى بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ فَعَلَى ٱللَّهِ تَوَكَّلْتُ فَأَجْمِعُوٓا۟ أَمْرَكُمْ وَشُرَكَآءَكُمْ ثُمَّ لَا يَكُنْ أَمْرُكُمْ عَلَيْكُمْ غُمَّةً ثُمَّ ٱقْضُوٓا۟ إِلَىَّ وَلَا تُنظِرُونِ ﴿٧١﴾ فَإِن تَوَلَّيْتُمْ فَمَا سَأَلْتُكُم مِّنْ أَجْرٍ إِنْ أَجْرِىَ إِلَّا عَلَى ٱللَّهِ وَأُمِرْتُ أَنْ أَكُونَ مِنَ ٱلْمُسْلِمِينَ ﴿٧٢﴾ فَكَذَّبُوهُ فَنَجَّيْنَٰهُ وَمَن مَّعَهُۥ فِى ٱلْفُلْكِ وَجَعَلْنَٰهُمْ خَلَٰٓئِفَ وَأَغْرَقْنَا ٱلَّذِينَ كَذَّبُوا۟ بِـَٔايَٰتِنَا فَٱنظُرْ كَيْفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلْمُنذَرِينَ ﴿٧٣﴾ ثُمَّ بَعَثْنَا مِنۢ بَعْدِهِۦ رُسُلًا إِلَىٰ قَوْمِهِمْ فَجَآءُوهُم بِٱلْبَيِّنَٰتِ فَمَا كَانُوا۟ لِيُؤْمِنُوا۟ بِمَا كَذَّبُوا۟ بِهِۦ مِن قَبْلُ كَذَٰلِكَ نَطْبَعُ عَلَىٰ قُلُوبِ ٱلْمُعْتَدِينَ ﴿٧٤﴾ ثُمَّ بَعَثْنَا مِنۢ بَعْدِهِم مُّوسَىٰ وَهَٰرُونَ إِلَىٰ فِرْعَوْنَ وَمَلَإِي۟هِۦ بِـَٔايَٰتِنَا فَٱسْتَكْبَرُوا۟ وَكَانُوا۟ قَوْمًا مُّجْرِمِينَ ﴿٧٥﴾ فَلَمَّا جَآءَهُمُ ٱلْحَقُّ مِنْ عِندِنَا قَالُوٓا۟ إِنَّ هَٰذَا لَسِحْرٌ مُّبِينٌ ﴿٧٦﴾ قَالَ مُوسَىٰٓ أَتَقُولُونَ لِلْحَقِّ لَمَّا جَآءَكُمْ أَسِحْرٌ هَٰذَا وَلَا يُفْلِحُ ٱلسَّٰحِرُونَ ﴿٧٧﴾ قَالُوٓا۟ أَجِئْتَنَا لِتَلْفِتَنَا عَمَّا وَجَدْنَا عَلَيْهِ ءَابَآءَنَا وَتَكُونَ لَكُمَا ٱلْكِبْرِيَآءُ فِى ٱلْأَرْضِ وَمَا نَحْنُ لَكُمَا بِمُؤْمِنِينَ ﴿٧٨﴾

(٧١) (ئەی پێغەمبەر ﷺ) بەسەرهات و هەواڵی نوح بەسەر ئەو خەڵکەدا بخوێنەرەوە، کاتێک بە قەومەکەی خۆی وت: ئەی قەوم و کەسم، ئەگەر ئێوە سەغڵەتن، بەمانەوەی من لەناوتاندا و یادخستنەوەی ئایاتەکانی خواتان لاگرانە ئەوە دڵنیابن کە من کۆڵ نادەم، پشتم بەخوا بەستووە لەو کارەمدا، (ئیتر ئێوە چیتان لە دەست دێت دریغی مەکەن) خۆتان و بتەکانتان و هاوبیرو باوەڕەکانتان بکەونە خۆو رای خۆتان کۆبکەنەوە، پاشان بەئاشکرا چی دەکەن بیکەن، هەرچیتان لە دەست دێت دژ بە من ئەنجامی بدەن (مەتان نەبێت)، مۆڵەتم مەدەن.

(٧٢) جا ئەگەر پشتم تێبکەن و باوەڕم پێنەکەن (پێم سەیرە چونکە): ئەوە من هیچ پاداشتێک و هیچ شتێکم لە ئێوە داوا نەکردووە، بەڵکو پاداشتم تەنها لەسەر خوایە و من فەرمانم پێ دراوە کە لە ڕیزی موسوڵماناندا بم.

(٧٣) کەچی بانگەوازەکەیان بە درۆ زانی، ئینجا ئێمەش نوح و هەموو ئەوانەی کە لەگەڵیدا بوون لە کەشتیەکەدا رزگارمان کردن و کردیشمانن بە جێنشین و هەموو ئەوانەمان نوقمی ڕەهێڵ و زریانەکە کرد کەبڕوایان بەئایەت و فەرمانەکانی ئێمە نەبوو، ئینجا تەماشاکەو سەرنج بدە و بزانە سەرئەنجامی ئەو کەسانە چۆن بوو کە بێدار کرابوونەوە و هۆشیاریان پێدرابوو.

(٧٤) پاشان دوای نوح، پێغەمبەرانی ترمان نارد بۆ سەر قەومەکانیان، جا ئەوانیش بە چەندەها بەڵگەو نیشانەو موعجیزەی زۆرەوە هاتن، کەچی ئەو خەڵکە باوەڕیان نەدەهێنا بەوەی کە پێشتر باوەڕیان پێی نەبوو، ئابەو شێوەیە ئێمە مۆر دەنێین بەسەر دڵی دەستدرێژکاراندا.

(٧٥) جا دوای ئەوان موسا و هاروونمان ڕەوانە کرد بۆ فیرعەون و دارودەستەکەی، هاوڕێ لەگەڵ موعجیزەی زۆردا کەچی ئەوان خۆیان بە گەورە زانی و بڕوایان پێ نەکردن، ئەوانە کەسانێکی تاوانبار و گوناهباربوون.

(٧٦) جا کاتێک حەقیقەتیان لەلایەن ئێمەوە (لە ڕێگەی موساوە) بۆ هات وتیان: بەڕاستی ئەمە جادوویەکی ئاشکرایە!!

(٧٧) موسا پێی وتن: باشە ئێوە بەم حەقیقەت و ڕاستیەی کە بۆم هێناون دەڵێن:(جادوو)؟! ئایا ئەم موعجیزە جۆراو جۆرانە جادوون؟!! خۆ جادووگەران سەرفراز نابن؟!

(٧٨) (فیرعەون و دارو دەستەی) وتیان: باشە تۆ بۆ ئەوە هاتوویت کە وێڵمان بکەیت لەو بیروباوەڕو بەرنامەیەی کە باوو باپیرانمان لەسەری بوون و لەوانەوە بۆ ئێمە ماوەتەوە؟ (ئایا بەم ڕێبازە) دەتانەوێت دەسەڵاتداری و گەورەیی بۆ خۆتان لەسەر زەویدا بەدەست بهێنن؟! ئێمە بڕواتان پێ ناکەین!!

وَقَالَ فِرْعَوْنُ ٱئْتُونِى بِكُلِّ سَٰحِرٍ عَلِيمٍ ﴿٧٩﴾ فَلَمَّا جَآءَ ٱلسَّحَرَةُ
قَالَ لَهُم مُّوسَىٰٓ أَلْقُوا۟ مَآ أَنتُم مُّلْقُونَ ﴿٨٠﴾ فَلَمَّآ أَلْقَوْا۟ قَالَ
مُوسَىٰ مَا جِئْتُم بِهِ ٱلسِّحْرُ ۖ إِنَّ ٱللَّهَ سَيُبْطِلُهُۥٓ ۖ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُصْلِحُ
عَمَلَ ٱلْمُفْسِدِينَ ﴿٨١﴾ وَيُحِقُّ ٱللَّهُ ٱلْحَقَّ بِكَلِمَٰتِهِۦ وَلَوْ كَرِهَ
ٱلْمُجْرِمُونَ ﴿٨٢﴾ فَمَآ ءَامَنَ لِمُوسَىٰٓ إِلَّا ذُرِّيَّةٌ مِّن قَوْمِهِۦ عَلَىٰ
خَوْفٍ مِّن فِرْعَوْنَ وَمَلَإِي۟هِمْ أَن يَفْتِنَهُمْ ۚ وَإِنَّ فِرْعَوْنَ لَعَالٍ
فِى ٱلْأَرْضِ وَإِنَّهُۥ لَمِنَ ٱلْمُسْرِفِينَ ﴿٨٣﴾ وَقَالَ مُوسَىٰ يَٰقَوْمِ إِن كُنتُمْ
ءَامَنتُم بِٱللَّهِ فَعَلَيْهِ تَوَكَّلُوٓا۟ إِن كُنتُم مُّسْلِمِينَ ﴿٨٤﴾ فَقَالُوا۟ عَلَى ٱللَّهِ
تَوَكَّلْنَا رَبَّنَا لَا تَجْعَلْنَا فِتْنَةً لِّلْقَوْمِ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٨٥﴾ وَنَجِّنَا
بِرَحْمَتِكَ مِنَ ٱلْقَوْمِ ٱلْكَٰفِرِينَ ﴿٨٦﴾ وَأَوْحَيْنَآ إِلَىٰ مُوسَىٰ وَأَخِيهِ
أَن تَبَوَّءَا لِقَوْمِكُمَا بِمِصْرَ بُيُوتًا وَٱجْعَلُوا۟ بُيُوتَكُمْ قِبْلَةً
وَأَقِيمُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ ۗ وَبَشِّرِ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴿٨٧﴾ وَقَالَ مُوسَىٰ
رَبَّنَآ إِنَّكَ ءَاتَيْتَ فِرْعَوْنَ وَمَلَأَهُۥ زِينَةً وَأَمْوَٰلًا فِى ٱلْحَيَوٰةِ
ٱلدُّنْيَا رَبَّنَا لِيُضِلُّوا۟ عَن سَبِيلِكَ ۖ رَبَّنَا ٱطْمِسْ عَلَىٰٓ أَمْوَٰلِهِمْ
وَٱشْدُدْ عَلَىٰ قُلُوبِهِمْ فَلَا يُؤْمِنُوا۟ حَتَّىٰ يَرَوُا۟ ٱلْعَذَابَ ٱلْأَلِيمَ ﴿٨٨﴾

(٧٩) (ئینجا فیرعەون فەرمانیدا) وتی: ئادەی هەرچی جادووگەری زاناو شارەزا هەیە بهێنن و بۆم کۆ بکەنەوە.

(٨٠) جا کاتێک جادووگەران هاتن و (بڕیاردرا جادووگەریی خۆیان بنوێنن و موعجیزەی موسا بەتاڵ بکەنەوە) موسا پێی وتن: دەی چیتان هەیە فڕێی بدەن و بیخەنە روو!!

(٨١) ئەوسا (جادووگەران، جادووی خۆیان نواند) موسا وتی: هەرچی کردووتانە و نیشانی ئەو خەڵکەتانداوە هەمووی جادووە و هیچی تر، بێگومان خوا دوای تاوێکی تر پووچی دەکاتەوە، بەڕاستی خوا کردەوەی ئەوانەی کە تۆوی خراپە دەچێنن چاک و سەرکەوتوو ناکات.

(٨٢) بەڵکو خوا حەق و راستی دەچەسپێنێت بەفەرمان و ویستەکانی خۆی ئەگەر چی تاوانکارو تاوانباران پێیان ناخۆش بێت.

(٨٣) سەرئەنجام کەس باوەڕی بە موسا نەهێنا جگەلە چەند لاوێک (چونکە زۆربەی خەڵکەکە) دەترسان لە فیرعەون و دارودەستەی کە بەڵایان بەسەربهێنن و تووشی ئازارو ئەشکەنجەیان بکەن، بەڕاستی فیرعەون خۆی بەگەورەو بڵند دەزانی لە زەویدا، بەڕاستی ئەو لەسنوور ترازاوان بوو.

(٨٤) موساش بە قەومەکەی وت: ئەی قەوم و عەشرەتم، ئەگەر ئێوە بەڕاستی باوەڕتان بەخوا هێناوە، ئەوە ئیتر هەر پشت بەو ببەستن ئەگەر موسوڵمان و ملکەچن.

(٨٥) ئەوسا (ئیمانداران) وتیان: ئێمە ئیتر هەر پشتمان بەخوا بەستووە، پەروەردگارا مەمانگێڕە بەهۆکاری سەرگەردانی بۆ قەومی ستەمکاران (کە هەم ئێمە ئازار بدەن هەم خۆشیان گوناهبار ببن و دوور بکەونەوە لە ئیمان).

(٨٦) هەروەها بەرەحمەت و میهرەبانی خۆت (دەرووی خێرمان لێ بکەرەوە) رزگارمان بکە لە دەست هۆز و دەستەی بێباوەڕان.

(٨٧) ئێمە وەحیشمان نارد بۆ موسا عليه السلام و براکەی تالە میسردا چەند ژوورێک ئامادە بکەن و ئەو ژوورانەش بکەنە شوێنی خواپەرستی و رووی تێبکەن و پێمان وتن نوێژەکانتان بەچاکی ئەنجام بدەن، مژدەش بدە بە ئیمانداران.

(٨٨) (جا کاتێک ستەمی فیرعەون لە سنوور دەرچوو) موسا نزای کردوو وتی: پەروەردگارا، بەڕاستی تۆ لەژیانی دنیادا ناز و نیعمەت و ماڵ و حاڵ و جێگە و رێگەی خۆش و رازاوەت بەخشیووە بەفیرعەون و دارودەستەی، پەروەردگارا، ئەو شتانە بووەتە هۆی ئەوەی کە(خەڵکی) لە رێبازو بەرنامەی تۆ وێڵ و گومڕابن، پەروەردگارا: ماڵ و سامانیان تەفرو تونا بکەو کوێری بکەرەوە، دڵیان بگوشە (تا هەست بەخۆشی نەکەن)، ئەمانە باوەڕ ناهێنن هەتا سزاو ئازاری بەئێش نەبینن.



قَالَ قَدْ أُجِيبَت دَّعْوَتُكُمَا فَاسْتَقِيمَا وَلَا تَتَّبِعَانِّ سَبِيلَ الَّذِينَ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٨٩﴾ ۞ وَجَٰوَزْنَا بِبَنِي إِسْرَٰٓءِيلَ الْبَحْرَ فَأَتْبَعَهُمْ فِرْعَوْنُ وَجُنُودُهُ بَغْيًا وَعَدْوًا حَتَّىٰٓ إِذَآ أَدْرَكَهُ الْغَرَقُ قَالَ ءَامَنتُ أَنَّهُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا الَّذِيٓ ءَامَنَتْ بِهِ بَنُوٓا إِسْرَٰٓءِيلَ وَأَنَا۠ مِنَ الْمُسْلِمِينَ ﴿٩٠﴾ ءَآلْـَٰٔنَ وَقَدْ عَصَيْتَ قَبْلُ وَكُنتَ مِنَ الْمُفْسِدِينَ ﴿٩١﴾ فَالْيَوْمَ نُنَجِّيكَ بِبَدَنِكَ لِتَكُونَ لِمَنْ خَلْفَكَ ءَايَةً وَإِنَّ كَثِيرًا مِّنَ النَّاسِ عَنْ ءَايَٰتِنَا لَغَٰفِلُونَ ﴿٩٢﴾ وَلَقَدْ بَوَّأْنَا بَنِيٓ إِسْرَٰٓءِيلَ مُبَوَّأَ صِدْقٍ وَرَزَقْنَٰهُم مِّنَ الطَّيِّبَٰتِ فَمَا اخْتَلَفُوا حَتَّىٰ جَآءَهُمُ الْعِلْمُ إِنَّ رَبَّكَ يَقْضِي بَيْنَهُمْ يَوْمَ الْقِيَٰمَةِ فِيمَا كَانُوا فِيهِ يَخْتَلِفُونَ ﴿٩٣﴾ فَإِن كُنتَ فِي شَكٍّ مِّمَّآ أَنزَلْنَآ إِلَيْكَ فَسْـَٔلِ الَّذِينَ يَقْرَءُونَ الْكِتَٰبَ مِن قَبْلِكَ لَقَدْ جَآءَكَ الْحَقُّ مِن رَّبِّكَ فَلَا تَكُونَنَّ مِنَ الْمُمْتَرِينَ ﴿٩٤﴾ وَلَا تَكُونَنَّ مِنَ الَّذِينَ كَذَّبُوا بِـَٔايَٰتِ اللَّهِ فَتَكُونَ مِنَ الْخَٰسِرِينَ ﴿٩٥﴾ إِنَّ الَّذِينَ حَقَّتْ عَلَيْهِمْ كَلِمَتُ رَبِّكَ لَا يُؤْمِنُونَ ﴿٩٦﴾ وَلَوْ جَآءَتْهُمْ كُلُّ ءَايَةٍ حَتَّىٰ يَرَوُا الْعَذَابَ الْأَلِيمَ ﴿٩٧﴾

(٨٩) پەروەردگار فەرمووی: بێگومان دوعای هەردووکتان وەرگیرا (وادیارە هاروون (عليه السلام) بەکوڵ ئامینی کردوە)، بەڵام ئێوە هەر بەردەوام بن لەسەر ڕێبازی ڕاست و دروستی هیدایەت و شوێن ڕێبازی ئەوانە مەکەون کە حەق نازانن و نافامن.

(٩٠) ئەوسا ئەوەی ئیسرائیلمان بەدەریادا پەڕاندەوە، فیرعەون و سەربازانی بۆ ستەم و دەستدرێژی شوێنیان کەوتن، تا ئەو کاتەی (کە ئاوەکە چووەوە باری ئاسایی خۆی) فیرعەون خەریک بوو دەخنکا ئا لەو کاتەدا وتی: وا ئیتر باوەڕم هێنا بەوەی کە هیچ خوایەک نیە جگە لەو خوایەی کە نەوەی ئیسرائیل باوەڕیان پێهێناوە و من ئیتر لە موسوڵمان و ملکەچانم.

(٩١) (ئەوسا پێی وترا) ئایا ئێستە، (باوەڕ دەهێنیت!) لەکاتێدا بەراستی پێشتر یاخی بوویت و لە ڕیزی ئەوانەدا بوویت کە تۆوی خراپەیان دەچاند؟!

(٩٢) ئەمڕۆ ئیتر لاشەی تۆ ڕزگار دەکەین تا ببێتە موعجیزە و پەند و ئامۆژگاری بۆ ئەوانەی دوای تۆ دێن (دیارە خوای گەورە پاراستویەتی لەوەی کە ماسی بیخوات، شەپۆلی دەریا گەیاندیە کەنار، تا ئەوانەی کە بەخوایان دەزانی بەچاوی خۆیان ببینن کە فیرعەون ئادەمیزادێکە وەک ئەو خەڵکە و ببێتە پەند، بۆ هەموو پاشاو زۆردارەکانی سەر زەوی کە ئەوە سەرئەنجامی مسۆگەری هەموویانە)، بەڵام بەراستی زۆربەی خەڵکی لە ئایەت و موعجیزەکانی ئێمە غافڵ و بێئاگان.

(٩٣) (لەوەودوا) ئێمە دەرروومان لە نەوەی ئیسرائیل کردەوە و شوێن و جێگەو ڕێگەی خۆشمان پێبەخشین و لە چەندەها ڕزق و ڕۆزی چاک بەهرەوەرمان کردن، جا ئەوان جیاوازی و ناکۆکیان نەبوو هەتا زانست و زانیاری تەواویان بۆ هات (کەچی ئەوان دینی خوا کە هۆی یەکبوون و یەکگرتووییە کردیانە هۆی دووبەرەکی و جیاوازی هەرچەندە زانست و زانیاریشیان لەو بارەیەوە هەبوو)، بەڕاستی پەروەردگاری تۆ (ئەی محمد ﷺ) داوەری دەکات لە نێوانیاندا لە ڕۆژی قیامەتدا لەو کێشەو شتانەدا کە ئەوان جیاوازی و ناکۆکی تێدا دەکەن.

(٩٤) جا ئەگەر تۆ (دەربارەی ئەو شتانەی کە بۆمان دابەزاندوویت لەبارەی نەوەی ئیسرائیلەوە لە شک و گوماندایت، ئەوە پرسیار بکە لەو کەسانەی کە پێش تۆ لە تەورات شارەزان و دەیخوێننەوە، سوێند بەخوا بەڕاستی حەق و ڕاستیت لەلایەن پەروەردگارتەوە بۆ هاتووە، کەوابوو بەهیچ شێوەیەک گومانت نەبێت و مەچۆرە ڕیزی گوماندارانەوە.

(٩٥) (هەروەها) نەکەیت بچیتە ڕیزی کەسانێکەوە کە باوەڕیان بە موعجیزە و نیشانەکانی (دەسەڵاتدارێتی) خوا نیە، چونکە ئەگەر وابیت، دەچیتە ڕیزی خەسارەتمەند و زەرەرمەندانەوە.

(٩٦) بەڕاستی ئەوانەی کە وەک فیرعەون و دارو دەستەی ستەمکارو تاوانبارو گوناهکارن، بڕیاردادەی پەروەردگارت لەسەریان چەسپا، ئەوانە: باوەڕ ناهێنن.

(٩٧) ئەگەر چی هەرچی بەڵگەو موعجیزە هەیە بۆیان پێش بێت، ئەوانە هەر باوەڕ ناهێنن هەتا سزای بەئێش و ئازار دەبینن.

فَلَوْلَا كَانَتْ قَرْيَةٌ ءَامَنَتْ فَنَفَعَهَآ إِيمَٰنُهَآ إِلَّا قَوْمَ يُونُسَ لَمَّآ
ءَامَنُوا۟ كَشَفْنَا عَنْهُمْ عَذَابَ ٱلْخِزْىِ فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا وَمَتَّعْنَٰهُمْ
إِلَىٰ حِينٍ ﴿٩٨﴾ وَلَوْ شَآءَ رَبُّكَ لَءَامَنَ مَن فِى ٱلْأَرْضِ كُلُّهُمْ
جَمِيعًا ۚ أَفَأَنتَ تُكْرِهُ ٱلنَّاسَ حَتَّىٰ يَكُونُوا۟ مُؤْمِنِينَ ﴿٩٩﴾ وَمَا
كَانَ لِنَفْسٍ أَن تُؤْمِنَ إِلَّا بِإِذْنِ ٱللَّهِ ۚ وَيَجْعَلُ ٱلرِّجْسَ
عَلَى ٱلَّذِينَ لَا يَعْقِلُونَ ﴿١٠٠﴾ قُلِ ٱنظُرُوا۟ مَاذَا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ
وَٱلْأَرْضِ ۚ وَمَا تُغْنِى ٱلْءَايَٰتُ وَٱلنُّذُرُ عَن قَوْمٍ لَّا يُؤْمِنُونَ ﴿١٠١﴾
فَهَلْ يَنتَظِرُونَ إِلَّا مِثْلَ أَيَّامِ ٱلَّذِينَ خَلَوْا۟ مِن قَبْلِهِمْ ۚ
قُلْ فَٱنتَظِرُوٓا۟ إِنِّى مَعَكُم مِّنَ ٱلْمُنتَظِرِينَ ﴿١٠٢﴾ ثُمَّ نُنَجِّى
رُسُلَنَا وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ۚ كَذَٰلِكَ حَقًّا عَلَيْنَا نُنجِ ٱلْمُؤْمِنِينَ
﴿١٠٣﴾ قُلْ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِن كُنتُمْ فِى شَكٍّ مِّن دِينِى فَلَآ أَعْبُدُ ٱلَّذِينَ
تَعْبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ وَلَٰكِنْ أَعْبُدُ ٱللَّهَ ٱلَّذِى يَتَوَفَّىٰكُمْ ۖ وَأُمِرْتُ
أَنْ أَكُونَ مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴿١٠٤﴾ وَأَنْ أَقِمْ وَجْهَكَ لِلدِّينِ حَنِيفًا
وَلَا تَكُونَنَّ مِنَ ٱلْمُشْرِكِينَ ﴿١٠٥﴾ وَلَا تَدْعُ مِن دُونِ ٱللَّهِ
مَا لَا يَنفَعُكَ وَلَا يَضُرُّكَ ۖ فَإِن فَعَلْتَ فَإِنَّكَ إِذًا مِّنَ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿١٠٦﴾

(٩٨) جادەبوایە خەڵکی ئەو شارو شارۆچکانەی هەرەشەیان لێکرابوو باوەڕیان بهێنایە و باوەڕەکەیان سوود بەخش بوایە بۆیان، بەڵام باوەڕی هیچ کامیان سوودی پێنەگەیاندن جگە لە قەومی یونس (عليه السلام) نەبێت کاتێک کە باوەڕیان هێنا سزای سەرشۆڕیمان لە ژیانی دنیادا لەسەر هەڵگرتن و تا ماوەیەک لە نازو نیعمەت بەهرەوەرمان کردن.

(٩٩) خۆ ئەگەر پەروەردگارت بیویستایە (دەیتوانی بەزۆرو بەناچاری) هەر هەموو دانیشتووانی سەر زەوی باوەڕ بهێنن (بەڵام پەروەردگاری مەزن ڕێزی بۆ ئادەمیزاد داناوە و سەرپشکی کردووە)، جا ئایا تۆ (ئەی پێغەمبەر ﷺ، ئەی ئیماندار) ئەتەوێ زۆر لەخەڵکی بکەی بۆ ئەوەی بڕواداربن؟!

(١٠٠) هیچ کەس بۆی نیە باوەڕ بهێنێت (هەتا هەوڵ نەدات و خۆی ماندوو نەکات و بیر نەکاتەوە و) ویستی خوایشی لەسەر نەبێت و سزای (توند و ریسواکەر) دەخاتە سەر ئەو کەسانەی کە عەقڵ و ژیری بەکار ناهێنن.

(١٠١) پێیان بڵێ: تەماشا بکەن و سەرنج بدەن: خوا چی دروست کردووە لە ئاسمانەکان و زەویدا، کەچی بەڵگە و نیشانە و ئاگاداریەکان سوودیان نیە بۆ ئەو کەسانەی کە باوەڕ ناهێنن و (ڕێبازی ئیمان ناگرنەبەر).

(١٠٢) (ئەو بێ باوەڕانە) چاوەڕێی چی دەکەن، مەگەر هەر چاوەڕێی ئەوە ناکەن کە ڕۆژگارێکیان بەسەر بهێنین وەک ئەوەی بەسەر ئەوانەی پێشیاندا هێنامان؟، بڵێ: جا ئێوە چاوەڕێ بن، بەراستی منیش لەگەڵ ئێوەدا لە چاوەڕوانانم.

(١٠٣) لەوەودوا (کاتێک بڕیارماندا خوانەناسان لەناو بەرین) پێغەمبەرانمان و ئەوانەی کە باوەڕیان هێناوە ڕزگار دەکەین، هەر بەو شێوەیە بە ئەرکی خۆمانی دەزانین کە ئیمانداران ڕزگار بکەین.

(١٠٤) بڵێ: ئەی خەڵکینە ئەگەر ئێوە گومانتان هەیە لەئاین و بەرنامەی من، ئەوە چاک بزانن کە: من هەرگیز ئەو شتانە ناپەرستم کە ئێوە لە جیاتی خوا دەیانپەرستن، بەڵکو ئەو خوایە دەپەرستم، کە مردنی ئێوەی بەدەستە و من فەرمانم پێدراوە کە لە دەستەی باوەڕداران بم.

(١٠٥) هەروەها فەرمانم پێدراوە کە بەراست و ڕەوان ڕووت بکەرە ئاین و دینداری بەوپەڕی ملکەچی ودڵسۆزیەوە، هەروەها فەرمانم پێدراوە کە: نەکەیت لە دەستەی موشریک و هاوەڵگەران بیت.

(١٠٦) هاناو هاواریش نەبەیت بۆ کەسێک یان شتێک لە جیاتی خوا، کە نە قازانجت پێ دەگەیەنێت نە زیان (چونکە قازانج و زیان هەر بەدەست خوایە)، خۆ ئەگەر کاری وا ئەنجام بدەیت، ئەوە بەراستی تۆ لە ستەمکارانیت.

(١٠٧) (ئەی ئینسان) ئەگەر خوا تووشی ناخۆشی و زیانێکت بکات، ئەوە هیچ کەس ناتوانێت فریات بکەوێت و لەسەرتی لابەرێت جگە لەو زاتە، یاخود ئەگەر بیەوێت تووشی خێرو خۆشیەکت بکات، ئەوە هیچ کەس ناتوانێت بەری فەزڵ و بەخششی خوا بگرێت، هەرکام کە بیەوێت لە بەندەکانی بەهرەوەر دەکات (لە نازو نیعمەتانی بێ‌شومار) ئەو زاتە هەمیشە لێخۆشبوو میهرەبانە.

(١٠٨) (ئەی پێغەمبەرﷺ) بڵێ: ئەی خەڵکینە بەڕاستی حەق و راستیتان لەلایەن پەروەردگارتانەوە بۆ هاتووە، ئەوەی رێبازی هیدایەتی وەرگرتبێت ئەوە سوودی بۆ خۆیەتی، ئەوەش گومڕا بووبێت و رێی ون کردبێت، ئەوە گومڕاییەکەی لەسەر خۆی دەکەوێت و من لێپرسراوو چاودێر نیم بەسەر کارو کردەوەی ئێوەوە.

(١٠٩) تۆ (ئەی پێغەمبەرﷺ) هەر شوێنی ئەو (بەرنامەیە) بکەوە کە لە رێگەی وەحی و نیگاوە بە تۆ دەگات و نارامگرو خۆگربە (لەبەرامبەر هەر کێشەیەکەوە کە خوانەناسان بۆت پێش دەهێنن) هەتا خوا خۆی داوەری دەکات و ئەو زاتە چاکترین و دادپەروەرترینی دادوەرانە.

سوورەتی (هود)

بەناوی خوای بەخشندە و میهرەبان

(١) (الر) لەسەرەتای سورەتی (البقرة) راڤەکراوە.

وَإِن يَمْسَسْكَ ٱللَّهُ بِضُرٍّ فَلَا كَاشِفَ لَهُۥٓ إِلَّا هُوَ ۖ وَإِن يُرِدْكَ بِخَيْرٍ فَلَا رَآدَّ لِفَضْلِهِۦ ۚ يُصِيبُ بِهِۦ مَن يَشَآءُ مِنْ عِبَادِهِۦ ۚ وَهُوَ ٱلْغَفُورُ ٱلرَّحِيمُ ﴿١٠٧﴾ قُلْ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ قَدْ جَآءَكُمُ ٱلْحَقُّ مِن رَّبِّكُمْ ۖ فَمَنِ ٱهْتَدَىٰ فَإِنَّمَا يَهْتَدِى لِنَفْسِهِۦ ۖ وَمَن ضَلَّ فَإِنَّمَا يَضِلُّ عَلَيْهَا ۖ وَمَآ أَنَا۠ عَلَيْكُم بِوَكِيلٍ ﴿١٠٨﴾ وَٱتَّبِعْ مَا يُوحَىٰٓ إِلَيْكَ وَٱصْبِرْ حَتَّىٰ يَحْكُمَ ٱللَّهُ ۚ وَهُوَ خَيْرُ ٱلْحَٰكِمِينَ ﴿١٠٩﴾

سورة هود

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

الٓر ۚ كِتَٰبٌ أُحْكِمَتْ ءَايَٰتُهُۥ ثُمَّ فُصِّلَتْ مِن لَّدُنْ حَكِيمٍ خَبِيرٍ ﴿١﴾ أَلَّا تَعْبُدُوٓا۟ إِلَّا ٱللَّهَ ۚ إِنَّنِى لَكُم مِّنْهُ نَذِيرٌ وَبَشِيرٌ ﴿٢﴾ وَأَنِ ٱسْتَغْفِرُوا۟ رَبَّكُمْ ثُمَّ تُوبُوٓا۟ إِلَيْهِ يُمَتِّعْكُم مَّتَٰعًا حَسَنًا إِلَىٰٓ أَجَلٍ مُّسَمًّى وَيُؤْتِ كُلَّ ذِى فَضْلٍ فَضْلَهُۥ ۖ وَإِن تَوَلَّوْا۟ فَإِنِّىٓ أَخَافُ عَلَيْكُمْ عَذَابَ يَوْمٍ كَبِيرٍ ﴿٣﴾ إِلَى ٱللَّهِ مَرْجِعُكُمْ ۖ وَهُوَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ ﴿٤﴾ أَلَآ إِنَّهُمْ يَثْنُونَ صُدُورَهُمْ لِيَسْتَخْفُوا۟ مِنْهُ ۚ أَلَا حِينَ يَسْتَغْشُونَ ثِيَابَهُمْ يَعْلَمُ مَا يُسِرُّونَ وَمَا يُعْلِنُونَ ۚ إِنَّهُۥ عَلِيمٌۢ بِذَاتِ ٱلصُّدُورِ ﴿٥﴾

ئەمە کتێب و پەیامێکە (لەو پیتانە پێکهاتووە) کە ئایەت و یاساکانی بەشێوەیەکی راست و دروست پێکەوە پەیوەست کراون و جۆشدراون، پاشان درێژەیان پێدراوە و روون کراونەتەوە لەلایەن زاتێکەوە کە داناو بە ئاگاو لێزانە.

(٢) (گرنگترین پەیامی ئەوەیە) کە: جگە لە خوا کەس مەپەرستن، بەڕاستی من (واتە محمد ﷺ) لەلایەن خواوە ترسێنەرو مژدەدەرم بۆتان.

(٣) هەروەها (خەڵکینە)! داوای لێخۆشبوون لە پەروەردگارتان بکەن، لەوەودوا بگەڕێنەوە بۆ لای، ئەوکاتە بەچاکی دەتانژێنێت بەژیانێکی چاک، تا کاتێکی دیاریکراو، هەروەها پاداشتی هەموو خاوەن چاکەیەک بەزیادەوە دەداتەوە، خۆ ئەگەر (ئێوە) پشت هەڵکەن و گوێڕایەڵی فەرمانی خوا نەبن، ئەوە بەڕاستی من دەترسم کە سزای رۆژێکی گەورە و سەخت یەخەتان پێ بگرێت (کە رۆژی قیامەتە، یان ئەو رۆژەی خوای گەورە لە ناوتان دەبات).

(٤) گەڕانەوەتان هەر بۆ لای خوایە، هەر ئەویش دەسەڵاتی بەسەر هەموو شتێکدا هەیە.

(٥) ئاگاداربن بەڕاستی ئەو (خوانەناسانە) خۆیان دادەنەوێنن، بۆ ئەوەی (بەخەیاڵی خۆیان) بەوە خۆیان لەخوای گەورە یان لە پێغەمبەر بشارنەوە، ئاگاداربن کە خوا ئاگای لێیانە کاتێک دەچنە ناو جێگەوە و خۆیان دادەپۆشن، هەروەها دەزانێت چی دەشارنەوە و چی ئاشکرا دەکەن (لە کردارو گوفتارو نیەتیان) چونکە بەڕاستی ئەو خوایە زانایە بەوەی لە دڵ و دەروون و سینەکاندا حەشار دراوە.



وَمَا مِن دَآبَّةٍ فِي ٱلْأَرْضِ إِلَّا عَلَى ٱللَّهِ رِزْقُهَا وَيَعْلَمُ مُسْتَقَرَّهَا وَمُسْتَوْدَعَهَا كُلٌّ فِي كِتَٰبٍ مُّبِينٍ ﴿٦﴾ وَهُوَ ٱلَّذِي خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ فِي سِتَّةِ أَيَّامٍ وَكَانَ عَرْشُهُۥ عَلَى ٱلْمَآءِ لِيَبْلُوَكُمْ أَيُّكُمْ أَحْسَنُ عَمَلًا وَلَئِن قُلْتَ إِنَّكُم مَّبْعُوثُونَ مِنۢ بَعْدِ ٱلْمَوْتِ لَيَقُولَنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ إِنْ هَٰذَآ إِلَّا سِحْرٌ مُّبِينٌ ﴿٧﴾ وَلَئِنْ أَخَّرْنَا عَنْهُمُ ٱلْعَذَابَ إِلَىٰٓ أُمَّةٍ مَّعْدُودَةٍ لَّيَقُولُنَّ مَا يَحْبِسُهُۥٓ أَلَا يَوْمَ يَأْتِيهِمْ لَيْسَ مَصْرُوفًا عَنْهُمْ وَحَاقَ بِهِم مَّا كَانُواْ بِهِۦ يَسْتَهْزِءُونَ ﴿٨﴾ وَلَئِنْ أَذَقْنَا ٱلْإِنسَٰنَ مِنَّا رَحْمَةً ثُمَّ نَزَعْنَٰهَا مِنْهُ إِنَّهُۥ لَيَـُٔوسٌ كَفُورٌ ﴿٩﴾ وَلَئِنْ أَذَقْنَٰهُ نَعْمَآءَ بَعْدَ ضَرَّآءَ مَسَّتْهُ لَيَقُولَنَّ ذَهَبَ ٱلسَّيِّـَٔاتُ عَنِّيٓ إِنَّهُۥ لَفَرِحٌ فَخُورٌ ﴿١٠﴾ إِلَّا ٱلَّذِينَ صَبَرُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ أُوْلَٰٓئِكَ لَهُم مَّغْفِرَةٌ وَأَجْرٌ كَبِيرٌ ﴿١١﴾ فَلَعَلَّكَ تَارِكٌۢ بَعْضَ مَا يُوحَىٰٓ إِلَيْكَ وَضَآئِقٌۢ بِهِۦ صَدْرُكَ أَن يَقُولُواْ لَوْلَآ أُنزِلَ عَلَيْهِ كَنزٌ أَوْ جَآءَ مَعَهُۥ مَلَكٌ إِنَّمَآ أَنتَ نَذِيرٌ وَٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ وَكِيلٌ ﴿١٢﴾

(٦) هیچ زیندەوەرێک نی‌یە لەم زەویەدا رزق و رۆزیەکەی لەسەر خوا نەبێت و ئاگادارە بەشوێنی حەوانەوە و شوێنی دەرچوونیان، هەموو شتێک تۆمارە لە دۆسیەی ئاشکرادا لە (لوح المحفوظ) دا.

(٧) ئەو خوایە زاتێکە ئاسمانەکان و زەوی لە ماوەی شەش رۆژدا دروستکرد، تەختی فەرمانڕەوایەتی (کە دروستکراوێکی زۆر گەورە و شکۆمەندە) لەسەر ئاو بوو، تا تاقیتان بکاتەوە کە کێتان کاری چاکتر ئەنجام دەدات (فەرمانبەردارێکی چاکە)و سوێند بەخوا ئەگەر بڵێیت بەراستی ئێوە زیندوو دەکرێنەوە دوای مردن، بێگومان ئەوانەی کە بێباوەڕ بوون دەڵێن: ئەم قسە و باسە هیچ نیە، تەنها جادوویەکی ئاشکرایە.

(٨) سوێند بەخوا ئەگەر سزادانیان دوا بخەین تا چەند کاتێکی دیاریکراو، ئەوە بێگومان (بە گاڵتەوە) دەڵێن: چی ئەو سزایەی بەند کردووە و دوای خستووە و کوا بۆ پێش نایەت؟ ئاگاداربن! ئەو رۆژەی بەخەیان پێدەگرێت کەسیان لێی دەرباز ناکرێت و لەکۆڵیان نابێتەوە، ئەو سزایەش کە ئەوان گاڵتەیان پێدەکرد، دەیانگرێتەوە.

(٩) سوێند بەخوا ئەگەر خێرو خۆشی و ئاسودەییەکمان بە ئادەمیزاد بچێژین، لەوەودوا (بۆ تاقیکردنەوەی) لێی بسێنینەوە، ئەوە بەراستی دەبینیت ئەو کەسە نائومێدو بێ هیوا و سوپاس ناپەزێرە و قسەو گوفتاری بۆنی بێ باوەڕی و خوانەناسی لێ دێت.

(١٠) هەروەها ئەگەر دوای ئەو تەنگانە و ناخۆشیەی کە تووشی بوو، نازو نیعمەتی پێ بچێژین، ئەوە بێگومان دەڵێت: ئیتر هەرچی هەژاری و ناخۆشیە لە کۆڵم بۆتەوە و بەسەر چووە، چونکە بەراستی زۆر خۆشحاڵە و شانازی بەخۆیەوە دەکات و لە خۆی بایی دەبێت (وا دەزانێت هەروا ژیانی بەردەوام دەبێت).

(١١) جگە لەو کەسانەی کە خۆگرو ئارامگر بوون و کارو کردەوە چاکەکانیان ئەنجامداوە (لە خۆشی و ناخۆشیدا سروشتی خواناسییان ناگۆڕێت) ئا ئەوانە لێخۆش بوون و پاداشتی گەورە و فراوانیان بۆ هەیە.

(١٢) جا لەوانەیە تۆ (ئەی پێغەمبەر) واز بهێنیت لە هەندێ لەو باسانەی کە بە (وحی) بۆت رەوانەکراوە و دڵتەنگ و سەغڵەت بیت نەوەکو بڵێن: ئەوە بۆ گەنجینەیەک (لە زێڕو زیو) دانەبەزیوەتە سەری، یان فریشتەیەک بۆ گەیاندنی پەیامەکە نەهاتووە لەگەڵیدا، (تۆ خەفەت مەخۆ) چونکە بەراستی تۆ تەنها ترسێنەری، خوا خۆیشی ئاگادارو چاودێرە بەسەر هەموو شتێکدا (حسابیان بۆ دەکات).

أَمْ يَقُولُونَ ٱفْتَرَىٰهُ ۖ قُلْ فَأْتُوا۟ بِعَشْرِ سُوَرٍ مِّثْلِهِۦ مُفْتَرَيَٰتٍ وَٱدْعُوا۟ مَنِ ٱسْتَطَعْتُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ ﴿١٣﴾ فَإِلَّمْ يَسْتَجِيبُوا۟ لَكُمْ فَٱعْلَمُوٓا۟ أَنَّمَآ أُنزِلَ بِعِلْمِ ٱللَّهِ وَأَن لَّآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ۖ فَهَلْ أَنتُم مُّسْلِمُونَ ﴿١٤﴾ مَن كَانَ يُرِيدُ ٱلْحَيَوٰةَ ٱلدُّنْيَا وَزِينَتَهَا نُوَفِّ إِلَيْهِمْ أَعْمَٰلَهُمْ فِيهَا وَهُمْ فِيهَا لَا يُبْخَسُونَ ﴿١٥﴾ أُو۟لَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ لَيْسَ لَهُمْ فِى ٱلْءَاخِرَةِ إِلَّا ٱلنَّارُ ۖ وَحَبِطَ مَا صَنَعُوا۟ فِيهَا وَبَٰطِلٌ مَّا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴿١٦﴾ أَفَمَن كَانَ عَلَىٰ بَيِّنَةٍ مِّن رَّبِّهِۦ وَيَتْلُوهُ شَاهِدٌ مِّنْهُ وَمِن قَبْلِهِۦ كِتَٰبُ مُوسَىٰٓ إِمَامًا وَرَحْمَةً ۚ أُو۟لَٰٓئِكَ يُؤْمِنُونَ بِهِۦ ۚ وَمَن يَكْفُرْ بِهِۦ مِنَ ٱلْأَحْزَابِ فَٱلنَّارُ مَوْعِدُهُۥ ۚ فَلَا تَكُ فِى مِرْيَةٍ مِّنْهُ ۚ إِنَّهُ ٱلْحَقُّ مِن رَّبِّكَ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يُؤْمِنُونَ ﴿١٧﴾ وَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّنِ ٱفْتَرَىٰ عَلَى ٱللَّهِ كَذِبًا ۚ أُو۟لَٰٓئِكَ يُعْرَضُونَ عَلَىٰ رَبِّهِمْ وَيَقُولُ ٱلْأَشْهَٰدُ هَٰٓؤُلَآءِ ٱلَّذِينَ كَذَبُوا۟ عَلَىٰ رَبِّهِمْ ۚ أَلَا لَعْنَةُ ٱللَّهِ عَلَى ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿١٨﴾ ٱلَّذِينَ يَصُدُّونَ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ وَيَبْغُونَهَا عِوَجًا وَهُم بِٱلْءَاخِرَةِ هُمْ كَٰفِرُونَ ﴿١٩﴾

(١٣) بەڵکو (لەگەڵ ئەو هەموو بەڵگانەدا) ئەوانە دەڵێن کەمحمد قورئانی هەڵبەستووە، پێیان بڵێ: جا ئێوەش دە سوورەتی هەڵبەستراو وێنەی ئەم قورئانە بهێنن، هەر کەسیش لە خوای گەورە بەدەر، دەتوانن، بانگ بکەن (بۆ هاوکاریتان پەنای بۆ بەرن) ئەگەر راست دەکەن.

(١٤) جا ئەگەر (خوانەناسان) نەهاتن بەدەم ئەم داوایەتانەوە، ئەوە ئیتر چاک بزانن و دڵنیابن کە بەڕاستی ئەم قورئانە هەر بەئاگاداری خوای گەورە دابەزێنراوە و بشزانن جگە لەویش خوایەکی‌تر نیە، ئایا ئیتر ئێوە (ئەی بێ باوەڕان) ملکەچ دەبن؟

(١٥) هەر کەسێک تەنها ژیانی دنیاو رازاوەیی و (خۆشگوزەرانی) یەکەی بوێت، ئەوە پاداشتی هەوڵ و کۆششی ئەو جۆرە کەسانە دەدەینەوە لە دنیادا، ئەوانیش تێیدا هیچیان لێکەم ناکرێتەوە.

(١٦) ئا ئەوانە ئەوانەن کە لە رۆژی دوایدا جگە لە ئاگری دۆزەخ هیچی تریان بۆ نیە و ئەوەی کە کردیان لە دنیادا پووچەڵ بۆوە و بێ نرخە، هەروەها ئەو کاروکردەوەی کە دەیانکرد بەتاڵ و پووچ و بۆشە.

(١٧) (ئایا ئەو جۆرە کەسانەی کە باس کران) وەکو ئەو کەسە وایە کە لەلایەن پەروەردگاریەوە هەموو شتێکی بۆ روون کراوەتەوە، (ئەمیش باوەڕی پێیەتی چونکە) پێغەمبەرێک بەڵگەنامەی خوا دەخوێنێتەوە و لە پێش ئەمیشەوە پەیامەکەی موسا (کە تەوراتە) پێشەواو رەحمەت بووە، ئەو جۆرە کەسانەی (کە ژیرو هۆشمەندن) باوەڕی پێ دەهێنن، جا ئەو دەستە و کۆمەڵانەی کە باوەڕ بەم پەیامە ناکەن، ئەوە ئاگری دۆزەخ چاوەڕێیانە، نەکەیت تۆ لەجۆرە گومانێکدا بیت لەم قورئانەو لەم پەیامە، چونکە بەڕاستی ئەوە حەقیقەتە و لەلایەن پەروەردگارتەوە بۆت رەوانە کراوە، بەڵام زۆربەی خەڵکی باوەڕ ناهێنن.

(١٨) کێ لەوە ستەمکارترە کە درۆ بەناوی خواوە هەڵببەستێت (بەوەی کە بڵێ خوا هاوەڵ یان کوڕی هەیە) ئەوانە نیشانی پەروەردگاریان دەدرێن و شایەتەکانی قیامەت، کە فریشتە و پێغەمبەران و بانگخوازانن دەڵێن: ئا ئەوانە ئەوانەن درۆیان کرد بەدەم پەروەردگاریانەوە، ئاگاداربن! نەفرەتی خوا لەسەر ستەمکارانە...

(١٩) ئەوانەی بەنەرم و نیانی و لەسەرخۆ بەرهەڵستی پەیامی خوا دەکەن و بەلاری دەیانەوێت و دەیانەوێت بە هەڵەو ناتەواوی بیناسێنن بەخەڵکی و ئەوانە بەرۆژی دوایی بێ بڕوان.

أُوْلَٰٓئِكَ لَمۡ يَكُونُواْ مُعۡجِزِينَ فِي ٱلۡأَرۡضِ وَمَا كَانَ لَهُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ مِنۡ أَوۡلِيَآءَۘ يُضَٰعَفُ لَهُمُ ٱلۡعَذَابُۚ مَا كَانُواْ يَسۡتَطِيعُونَ ٱلسَّمۡعَ وَمَا كَانُواْ يُبۡصِرُونَ ﴿٢٠﴾ أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ خَسِرُوٓاْ أَنفُسَهُمۡ وَضَلَّ عَنۡهُم مَّا كَانُواْ يَفۡتَرُونَ ﴿٢١﴾ لَا جَرَمَ أَنَّهُمۡ فِي ٱلۡأٓخِرَةِ هُمُ ٱلۡأَخۡسَرُونَ ﴿٢٢﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ وَأَخۡبَتُوٓاْ إِلَىٰ رَبِّهِمۡ أُوْلَٰٓئِكَ أَصۡحَٰبُ ٱلۡجَنَّةِۖ هُمۡ فِيهَا خَٰلِدُونَ ﴿٢٣﴾ ۞ مَثَلُ ٱلۡفَرِيقَيۡنِ كَٱلۡأَعۡمَىٰ وَٱلۡأَصَمِّ وَٱلۡبَصِيرِ وَٱلسَّمِيعِۚ هَلۡ يَسۡتَوِيَانِ مَثَلًاۚ أَفَلَا تَذَكَّرُونَ ﴿٢٤﴾ وَلَقَدۡ أَرۡسَلۡنَا نُوحًا إِلَىٰ قَوۡمِهِۦٓ إِنِّي لَكُمۡ نَذِيرٞ مُّبِينٌ ﴿٢٥﴾ أَن لَّا تَعۡبُدُوٓاْ إِلَّا ٱللَّهَۖ إِنِّيٓ أَخَافُ عَلَيۡكُمۡ عَذَابَ يَوۡمٍ أَلِيمٖ ﴿٢٦﴾ فَقَالَ ٱلۡمَلَأُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ مِن قَوۡمِهِۦ مَا نَرَىٰكَ إِلَّا بَشَرٗا مِّثۡلَنَا وَمَا نَرَىٰكَ ٱتَّبَعَكَ إِلَّا ٱلَّذِينَ هُمۡ أَرَاذِلُنَا بَادِيَ ٱلرَّأۡيِ وَمَا نَرَىٰ لَكُمۡ عَلَيۡنَا مِن فَضۡلِۭ بَلۡ نَظُنُّكُمۡ كَٰذِبِينَ ﴿٢٧﴾ قَالَ يَٰقَوۡمِ أَرَءَيۡتُمۡ إِن كُنتُ عَلَىٰ بَيِّنَةٖ مِّن رَّبِّي وَءَاتَىٰنِي رَحۡمَةٗ مِّنۡ عِندِهِۦ فَعُمِّيَتۡ عَلَيۡكُمۡ أَنُلۡزِمُكُمُوهَا وَأَنتُمۡ لَهَا كَٰرِهُونَ ﴿٢٨﴾



(٢٠) ئا ئەوانە خوایان دەستەوستان نەکردووە لە زەویداو لە دەستی خوا دەرچن، بێجگە لە خوا هیچ پەناو یارمەتیدەرێکیان نیە (کەس فریایان ناکەوێت)و سزایان بۆ چەند بەرابەر دەکرێت، ئەوانە لە دنیادا ئەوەندە رقیان لە حەق و رێگەی خوا بوو، ئەوانە نەیاندەتوانی گوێ بگرن و راستی ببینن.

(٢١) ئا ئەوانەن ئەوانەن کە خۆیان فەوتاند و ئەو باس و درۆیانەی کە لە دنیادا هەڵیاندەبەست لێیان ون بوو.

(٢٢) گومانی تێدا نیە کە بەراستی ئەوانە لە قیامەتدا زۆر خەسارەتمەند و دۆڕاوترن.

(٢٣) بەڕاستی ئەوانەی بڕوایان هێناوە بەخواو راستی بەرنامەکەی، کردەوە چاکەکانیشیان ئەنجامداوەو گەڕاونەتەوە بۆ لای پەروەردگاریان و ملکەچ و دڵ ئارام بوون لە بەرامبەر فەرمانەکانی، ئا ئەوانە خاوەن و نیشتەجێی بەهەشتن و بە هەتا هەتایی تیایدا دەمێننەوە.

(٢٤) وێنەی ئەم دوو کۆمەڵە (کۆمەڵی ئیمانداران و کۆمەڵی بێباوەڕان) وەک کوێرو کەڕ، چاوساغ و بیسەر وایە، ئایا ئەم دووانە وێنەیان وەک یەکە، ئەوە بۆ بیر ناکەنەوە؟!

(٢٥) سوێند بەخوا بەڕاستی ئێمە و نوح و مان نارد بۆ لای قەوم وخزمەکانی، (پێی وتن) بێگومان من بۆ ئێوە داچڵەکێنەرێکی ئاشکرام (ئەگەر لە فەرمانی خوا دەرچن تووشی سزا دەبن، خۆ ئێوە باش من دەناسن).

(٢٦) کە جگە لە خوا (کەس و هیچی تر) نەپەرستن، چونکە من بەڕاستی دەترسم سزای رۆژێکی بەئێش یەخەتان پێ بگرێت (هەمووتان لەناو بچن).

(٢٧) جا ئەو دەستە دەسەڵاتدارەی کە بێ باوەڕ بوون لە هۆزی نوح وتیان: ئێمە تۆ تەنها وەک یەکێک لە خۆمان دەبینین و نابینین ئەوانەی شوێنی تۆ کەوتوون جگە لەوانەی کە هەژارو داماوەکانمانن و دووربین نین و ژیریان کەمە و سادەن، هەروەها نابینین ئێوە هیچ شتێکی زیاترتان بەسەر ئێمەدا هەبێت، بەڵکو ئێمە وا گومان دەبەین ئێوە درۆزنن.

(٢٨) نوح وتی: ئەی خزمەکانم هەواڵم بدەنێ: ئەگەر من لەسەر رێگەو بەرنامەیەکی راست و دروستبم لەلایەن پەروەدگارمەوە و خێرو چاکەو بەزەیی خۆی پێ بەخشیبم لەلایەن خۆیەوە، ئینجا ئەمانە لە ئێوە شاراوەتەوە و نایبینن؟! ئایا بەزۆر ئیمان لە دڵتاندا دروست بکەین و بتانخەینە سەر ئەم رێگەیە، لەکاتێکدا ئێوە لێی بێزارن و خوازیاری نین؟!!

وَيَٰقَوْمِ لَآ أَسْـَٔلُكُمْ عَلَيْهِ مَالًا ۖ إِنْ أَجْرِىَ إِلَّا عَلَى ٱللَّهِ ۚ وَمَآ
أَنَا۠ بِطَارِدِ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ ۚ إِنَّهُم مُّلَٰقُوا۟ رَبِّهِمْ وَلَٰكِنِّىٓ أَرَىٰكُمْ
قَوْمًا تَجْهَلُونَ ﴿٢٩﴾ وَيَٰقَوْمِ مَن يَنصُرُنِى مِنَ ٱللَّهِ إِن طَرَدتُّهُمْ ۚ
أَفَلَا تَذَكَّرُونَ ﴿٣٠﴾ وَلَآ أَقُولُ لَكُمْ عِندِى خَزَآئِنُ ٱللَّهِ وَلَآ
أَعْلَمُ ٱلْغَيْبَ وَلَآ أَقُولُ إِنِّى مَلَكٌ وَلَآ أَقُولُ لِلَّذِينَ تَزْدَرِىٓ
أَعْيُنُكُمْ لَن يُؤْتِيَهُمُ ٱللَّهُ خَيْرًا ۖ ٱللَّهُ أَعْلَمُ بِمَا فِىٓ أَنفُسِهِمْ ۖ إِنِّىٓ إِذًا
لَّمِنَ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٣١﴾ قَالُوا۟ يَٰنُوحُ قَدْ جَٰدَلْتَنَا فَأَكْثَرْتَ
جِدَٰلَنَا فَأْتِنَا بِمَا تَعِدُنَآ إِن كُنتَ مِنَ ٱلصَّٰدِقِينَ ﴿٣٢﴾ قَالَ
إِنَّمَا يَأْتِيكُم بِهِ ٱللَّهُ إِن شَآءَ وَمَآ أَنتُم بِمُعْجِزِينَ ﴿٣٣﴾ وَلَا يَنفَعُكُمْ
نُصْحِىٓ إِنْ أَرَدتُّ أَنْ أَنصَحَ لَكُمْ إِن كَانَ ٱللَّهُ يُرِيدُ أَن يُغْوِيَكُمْ ۚ
هُوَ رَبُّكُمْ وَإِلَيْهِ تُرْجَعُونَ ﴿٣٤﴾ أَمْ يَقُولُونَ ٱفْتَرَىٰهُ ۖ
قُلْ إِنِ ٱفْتَرَيْتُهُۥ فَعَلَىَّ إِجْرَامِى وَأَنَا۠ بَرِىٓءٌ مِّمَّا تُجْرِمُونَ ﴿٣٥﴾
وَأُوحِىَ إِلَىٰ نُوحٍ أَنَّهُۥ لَن يُؤْمِنَ مِن قَوْمِكَ إِلَّا مَن قَدْ ءَامَنَ
فَلَا تَبْتَئِسْ بِمَا كَانُوا۟ يَفْعَلُونَ ﴿٣٦﴾ وَٱصْنَعِ ٱلْفُلْكَ بِأَعْيُنِنَا
وَوَحْيِنَا وَلَا تُخَٰطِبْنِى فِى ٱلَّذِينَ ظَلَمُوٓا۟ ۚ إِنَّهُم مُّغْرَقُونَ ﴿٣٧﴾

(٢٩) ئەی خزمەکانم (خۆ من) لە بری ئەم بانگەواز و ئامۆژگاریانەم داوای هیچ ماڵ و خەرجیتان لێناکەم، کرێ و پاداشتم تەنها لای خوایە ، من هەرگیز ئەوانەی بڕوایان هێناوە لە خۆم دوور ناخەمەوە و دەریان ناکەم، چونکە بێگومان ئەوان ئەگەن بەخوای خۆیان، حیسابیان لای خوایە، بەڵام بەڕاستی من ئێوە ئەبینم هۆزێکن خۆتان گێل و نەفام دەکەن (بەوەی بە کەم سەیری ئیماندارانی دەوری من دەکەن لەبەر بێ کەسی و هەژاریان).

(٣٠) ئەی خزمەکانم کێ ئەتوانێت یارمەتیم بدات بەرامبەر خوای گەورە (لە سزای خوا بمپارێزێت) ئەگەر ئەو ئیماندارو دۆستانەی خوا دەربکەم و لە خۆمیان دوور بخەمەوە و ئایا بیرناکەنەوە (کە شتی وا ناشێت و دروست نیە بۆ کەسێک خواناس بێت)؟

(٣١) خۆ من پێتان ناڵێم گەنجینەکانی خوا لای منە و من شتی نادیارو غەیبیش نازانم، ناشڵێم بەڕاستی من فریشتەم، هەروەها ناڵێم بەو ئیماندارانەی لەبەر چاوی ئێوە کەم نرخن، خوای گەورە هەرگیز خێریان بەسەردا نارژێنێت، خوا خۆی ئاگادارە بەوەی لە دەروونیاندا هەیە، بێگومان من ئەو کاتە (ئەگەر وابکەم) لە ستەمکارانم.

(٣٢) (خەڵکەکە) وتیان: ئەی نوح بەڕاستی زۆر لەسەری چوویت و زیاد لە پێویست بەربەرەکانی و شەڕە قسەت لەگەڵدا کردین دەی ئەو سزایەمان بۆ بهێنە کە هەڕەشەی پێدەکەیت و هەمیشە باسی دەکەیت و دەمانترسێنی پێی، ئەگەر تۆ لە ڕاستگۆیانیت.

(٣٣) نوح لە وەڵامدا وتی: ئەوە بە دەست خوایە و بەڕاستی تەنها ئەو بۆتان پێش دەهێنێت ئەگەر بیەوێت و ئێوە دەستەوسانکەری خوا نین ناتوانن (ئەستەمە دەرباز بوونتان).

(٣٤) (وادیارە) ئامۆژگاری و دڵسۆزیم سوودتان پێناگەیەنێت ئەگەرچی بمەوێت بەردەوامیشبم لەسەر ئامۆژگاریتان، ئەگەر خوا بیەوێت سەرگەردانتان بکات ئەوە ئەو زاتە پەروەردگارتانە و هەر بۆ لای ئەویش دەبرێنەوە.

(٣٥) بەڵکو(بێ باوەڕانی مەککە) دەڵێن: ئەم باس و بابەتانە (محمد) خۆی هەڵی بەستووە، تۆیش بڵێ: ئەگەر من هەڵیبەستم ئەوە تاوانەکەی لەسەر خۆمە و منیش دوورە پەرێزو بەریم لەو تاوانەی کە دەیکەن.

(٣٦) (سەرەنجام) وەحی و پەیامی خوا ڕەوانەکرا بۆ نوح کە چاک بزانە بەڕاستی هەرگیز کەسی تر بڕوا ناهێنێت لە قەومەکەت جگە لەوەی کە بەڕاستی بڕوای هێناوە، کەوابوو خەفەتبار مەبە بەو کردەوە ناشیرین و ناپەسەندانەی ئەنجامیان دەدا.

(٣٧) کەشتییەکەش دروست بکە بەچاودێری و فەرمانی ئێمە،(کاتی تۆفانەکە) تکامان لێ نەکەیت بۆ ئەوانەی لە سنووری ڕاستی دەرچوون و تاوانبارن، چونکە بەڕاستی ئەوانە بڕیاری خنکاندن و تیاچوونیان بۆ دراوە.

وَيَصْنَعُ ٱلْفُلْكَ وَكُلَّمَا مَرَّ عَلَيْهِ مَلَأٌ مِّن قَوْمِهِۦ سَخِرُوا۟ مِنْهُ ۚ قَالَ إِن تَسْخَرُوا۟ مِنَّا فَإِنَّا نَسْخَرُ مِنكُمْ كَمَا تَسْخَرُونَ ﴿٣٨﴾ فَسَوْفَ تَعْلَمُونَ مَن يَأْتِيهِ عَذَابٌ يُخْزِيهِ وَيَحِلُّ عَلَيْهِ عَذَابٌ مُّقِيمٌ ﴿٣٩﴾ حَتَّىٰٓ إِذَا جَآءَ أَمْرُنَا وَفَارَ ٱلتَّنُّورُ قُلْنَا ٱحْمِلْ فِيهَا مِن كُلٍّ زَوْجَيْنِ ٱثْنَيْنِ وَأَهْلَكَ إِلَّا مَن سَبَقَ عَلَيْهِ ٱلْقَوْلُ وَمَنْ ءَامَنَ ۚ وَمَآ ءَامَنَ مَعَهُۥٓ إِلَّا قَلِيلٌ ﴿٤٠﴾ ۞ وَقَالَ ٱرْكَبُوا۟ فِيهَا بِسْمِ ٱللَّهِ مَجْر۪ىٰهَا وَمُرْسَىٰهَآ ۚ إِنَّ رَبِّى لَغَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿٤١﴾ وَهِىَ تَجْرِى بِهِمْ فِى مَوْجٍ كَٱلْجِبَالِ وَنَادَىٰ نُوحٌ ٱبْنَهُۥ وَكَانَ فِى مَعْزِلٍ يَٰبُنَىَّ ٱرْكَب مَّعَنَا وَلَا تَكُن مَّعَ ٱلْكَٰفِرِينَ ﴿٤٢﴾ قَالَ سَـَٔاوِىٓ إِلَىٰ جَبَلٍ يَعْصِمُنِى مِنَ ٱلْمَآءِ ۚ قَالَ لَا عَاصِمَ ٱلْيَوْمَ مِنْ أَمْرِ ٱللَّهِ إِلَّا مَن رَّحِمَ ۚ وَحَالَ بَيْنَهُمَا ٱلْمَوْجُ فَكَانَ مِنَ ٱلْمُغْرَقِينَ ﴿٤٣﴾ وَقِيلَ يَٰٓأَرْضُ ٱبْلَعِى مَآءَكِ وَيَٰسَمَآءُ أَقْلِعِى وَغِيضَ ٱلْمَآءُ وَقُضِىَ ٱلْأَمْرُ وَٱسْتَوَتْ عَلَى ٱلْجُودِىِّ ۖ وَقِيلَ بُعْدًا لِّلْقَوْمِ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٤٤﴾ وَنَادَىٰ نُوحٌ رَّبَّهُۥ فَقَالَ رَبِّ إِنَّ ٱبْنِى مِنْ أَهْلِى وَإِنَّ وَعْدَكَ ٱلْحَقُّ وَأَنتَ أَحْكَمُ ٱلْحَٰكِمِينَ ﴿٤٥﴾



(٣٨) (نوح) یش دەستی کرد بە دروستکردنی کەشتیەکە، هەر جارێک تاقمێک لە هۆزەکەی بەلایدا تێدەپەرین، گاڵتەیان پێ دەکرد، (نوح) وتی ئەگەر ئێستە ئێوە گاڵتە بە ئێمە دەکەن، ئەوە بەراستی ئێمەش رۆژێک دێت گاڵتە بە ئێوە بکەین وەک چۆن ئێوە گاڵتە بە ئێمە دەکەن.

(٣٩) جا لە داهاتوودا دەزانن کێ سزایەکی بۆ دێت کە ریسوای بکات، پاشان لە قیامەتدا دووچاری سزایەکی بەردەوام و هەمیشە دەبێت.

(٤٠) (ئەم کێشەیە بەردەوام بوو) هەتا ئەو کاتەی بڕیارمان هات و فەرمان دەرچوو (بە لەناوبردنی بێ باوەڕەکان) و لە تەنوورە پڕ لە ئاگرەکەوە ئاو فوارەی کرد (کە ئەوە نیشانەی دەست پێکردنی تۆڵە خواییەکە بوو) ئەوسا وتمان: ئەی نوح، لە هەموو نێرو مێیەک دووان هەڵبگرە لە کەشتیەکەداو ماڵ و خێزانت، جگە لەوانەی کە بڕیاریان لەسەر دراوە تووشی تۆڵە ببن بەهۆی بێباوەڕیانەوە، ئەوانەش هەڵگرە کە باوەڕیان هێناوە (شایانی باسە) کەسیش بڕوای بەنوح نەکردو لەگەڵیدا نەبوو، جگە لەکەسانێکی کەم نەبێت.

(٤١) نوح وتی: سواربن و بڕۆنە ناو کەشتیەکەوە، بەناوی خواوەیە ڕۆیشتنی و وەستانی، بێگومان پەروەردگارم زۆر لێخۆشبووە و زۆر بە بەزەییە.

(٤٢) کەشتیەکەش دەیبردن بەناو شەپۆلی وەک چیادا، نوح بانگی کردە کوڕەکەی (ئەوەیان کە بێباوەڕ بوو) لە شوێنێکی چەپەکدا گیری خوارد بوو پێی وت: رۆڵە گیان، لەگەڵ ئێمەدا سواربە و لەگەڵ بێباوەڕاندا مەبە.

(٤٣) کوڕەکەی وتی: پەنا ئەبەمە لای ئەو چیایەو دەمپارێزێت لەم زریان و ئاوە، (نوح) وتی: ئەمڕۆ هیچ پەنادەرێک نیە لە تۆڵە و خەشمی خوا کەس بپارێزێت مەگەر کەسێک خوا خۆی رەحمی پێ بکات، ئەوسا (دوای ئەم ووت و وێژە) شەپۆلی ئاو دای بەنێوانیاندا و جا چووە ریزی خنکاوەکانەوە.

(٤٤) پاشان فەرماندرا بە زەوی: ئاوەکەت با رۆبچێت بەناختدا، ئەی ئاسمان: تۆش با بەس بێت و باران مەبارێنە، ئیتر ئاوەکە رۆچوو، فەرمانیش بەرێکی و تەواوی ئەنجامدرا، کەشتیەکەش لەسەر کێوی جودی (کە لە کوردستانی باکوورە) وەستاو لەنگەری گرت و وترا: دەک دووری لە بەزەیی خواو تیاچوون بۆ بەرەی ستەمکاران.

(٤٥) (پاش هێور بوونەوەی زریانەکە) نوح هاواری لە خوا کردو جا وتی: ئەی پەروەردگارم کوڕەکەم لە خێزانی من بوو، بێگومان پەیمانی تۆش راستە و (کاتی خۆی فەرمووت خێزانی تۆ رزگارن لە تیاچوون) و تۆیش زاناترین و دادپەروەرترینی فەرمانڕەوایانیت.

قَالَ يَٰنُوحُ إِنَّهُۥ لَيْسَ مِنْ أَهْلِكَ ۖ إِنَّهُۥ عَمَلٌ غَيْرُ صَٰلِحٍ ۖ فَلَا تَسْـَٔلْنِ
مَا لَيْسَ لَكَ بِهِۦ عِلْمٌ ۖ إِنِّىٓ أَعِظُكَ أَن تَكُونَ مِنَ ٱلْجَٰهِلِينَ ﴿٤٦﴾
قَالَ رَبِّ إِنِّىٓ أَعُوذُ بِكَ أَنْ أَسْـَٔلَكَ مَا لَيْسَ لِى بِهِۦ عِلْمٌ ۖ وَإِلَّا
تَغْفِرْ لِى وَتَرْحَمْنِىٓ أَكُن مِّنَ ٱلْخَٰسِرِينَ ﴿٤٧﴾ قِيلَ يَٰنُوحُ
ٱهْبِطْ بِسَلَٰمٍ مِّنَّا وَبَرَكَٰتٍ عَلَيْكَ وَعَلَىٰٓ أُمَمٍ مِّمَّن مَّعَكَ ۚ
وَأُمَمٌ سَنُمَتِّعُهُمْ ثُمَّ يَمَسُّهُم مِّنَّا عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿٤٨﴾ تِلْكَ
مِنْ أَنۢبَآءِ ٱلْغَيْبِ نُوحِيهَآ إِلَيْكَ ۖ مَا كُنتَ تَعْلَمُهَآ أَنتَ وَلَا قَوْمُكَ
مِن قَبْلِ هَٰذَا ۖ فَٱصْبِرْ ۖ إِنَّ ٱلْعَٰقِبَةَ لِلْمُتَّقِينَ ﴿٤٩﴾ وَإِلَىٰ عَادٍ
أَخَاهُمْ هُودًا ۚ قَالَ يَٰقَوْمِ ٱعْبُدُوا۟ ٱللَّهَ مَا لَكُم مِّنْ إِلَٰهٍ
غَيْرُهُۥٓ ۖ إِنْ أَنتُمْ إِلَّا مُفْتَرُونَ ﴿٥٠﴾ يَٰقَوْمِ لَآ أَسْـَٔلُكُمْ عَلَيْهِ
أَجْرًا ۖ إِنْ أَجْرِىَ إِلَّا عَلَى ٱلَّذِى فَطَرَنِىٓ ۚ أَفَلَا تَعْقِلُونَ ﴿٥١﴾
وَيَٰقَوْمِ ٱسْتَغْفِرُوا۟ رَبَّكُمْ ثُمَّ تُوبُوٓا۟ إِلَيْهِ يُرْسِلِ ٱلسَّمَآءَ
عَلَيْكُم مِّدْرَارًا وَيَزِدْكُمْ قُوَّةً إِلَىٰ قُوَّتِكُمْ وَلَا تَتَوَلَّوْا۟
مُجْرِمِينَ ﴿٥٢﴾ قَالُوا۟ يَٰهُودُ مَا جِئْتَنَا بِبَيِّنَةٍ وَمَا نَحْنُ
بِتَارِكِىٓ ءَالِهَتِنَا عَن قَوْلِكَ وَمَا نَحْنُ لَكَ بِمُؤْمِنِينَ ﴿٥٣﴾

(٤٦) خوای گەورەش فەرمووی: ئەی نوح بەراستی ئەو لە خێزانی تۆ نەبوو، چونکە بەراستی ئەو کرداری چاك نەبوو، کەوابوو داوای شتێکم لیٚ مەکە کە زانیاریت دەربارەی نیە، بێگومان من ئامۆژگاریت دەکەم کە کارێك نەکەیت خۆت بخەیتە ریزی نەفامانەوە.

(٤٧) (ئینجا نوح) وتی: ئەی پەروەردگارم، بەراستی من پەنا دەگرم بە تۆ کە داوای شتێك بکەم زانیاریم پێی نەبێت، خۆ ئەگەر لێم خۆش نەبیت و بەزەییت پێمدا نەیەتەوە ئەوە دەچمە ریزی خەسارەتمەندانەوە.

(٤٨) (ئەوسا لەلایەن خوای گەورەوە) وترا: ئەی نوح وەرە خوارەوە و دابەزە لە کەشتیەکەو لە چیای جودی بۆ دەشتایی بەبێوەیی و سەلامەتی لەلایەن ئێمەوە، بەرەکەتی زۆریش لەسەر تۆو ئەو کۆمەڵ و خەڵکانەی لەگەڵ تۆدان، خەڵکانێکی تریش لەمەو دوا دێن و لە نازو نیعمەت بەهرەوەریان دەکەین، پاشان (بەهۆی لاری و بیٚ بڕواییانەوە) سزای بەسۆیان تووش دەبێت لەلایەن ئێمەوە.

(٤٩) ئەی محمد ﷺ ئەو باسانەی بۆمان کردیت لە هەواڵە نادیارەکانە کە بۆت دەنێرین، نەتۆ دەتزانی و نە هۆز و نەتەوەکەشت پێش ئەم باسەی ئێمە، جا خۆگرو بە ئارام بە، چونکە بەراستی پاشەرۆژ بۆ خواناس و پارێزکارانە.

(٥٠) بۆ لای هۆزی (عاد) یش، هودی برایانمان نارد، وتی: ئەی خزمەکانم، خوا بپەرستن و فەرمانبەرداری ئەو بن، هیچ خوایەکی ترتان نیە جگە لەو، ئێوە هیچ راستیەکتان نی‌یە جگە لە درۆ هەڵبەستن.

(٥١) (هود وتی) ئەی خزمەکانم من لەسەر ئەم کارو بانگەوازە خواییەی کە بەنێوەی رادەگەیەنم هیچ کرێ و پاداشتێکتان لیٚ داوا ناکەم، کرێ و پاداشتم تەنها لەسەر ئەو زاتەیە کە بەدی هێناوم، باشە ئەوە بیر ناکەنەوە و ژیرنابن؟!

(٥٢) ئەی خزمەکانم داوای لێخۆشبوون لە پەروەردگارتان بکەن، پاشان بگەرێنەوە بۆ لای ئەو، ئەوە لە ئاسمانەوە بارانی زۆری پڕ بەرەکەتتان بۆ دەبارێنێت، هێزو دەسەڵاتتان بۆ زیاد دەکات، زیاد لە هێزو دەسەڵاتی ئاسایی خۆتان، روو وەرمەگێرن لەم باس و ئامۆژگاریانە لەکاتێکدا کە هەمیشە تاوانبارن.

(٥٣) وتیان ئەی هود: بەڵگەیەکی زۆر رۆشنت بۆ نەهێناوین تا بە تەواوی ئێمە قەناعەت بکەین (کە تۆ پێغەمبەری خوایت)و ئێمەش واز لە خواکانی خۆمان ناهێنین بەقسەی تۆ، ئێمە ئیمان و بڕوامان نیە بەراستێتی تۆ.

إِن نَّقُولُ إِلَّا ٱعْتَرَىٰكَ بَعْضُ ءَالِهَتِنَا بِسُوٓءٍ ۗ قَالَ إِنِّىٓ أُشْهِدُ ٱللَّهَ
وَٱشْهَدُوٓا۟ أَنِّى بَرِىٓءٌ مِّمَّا تُشْرِكُونَ ﴿٥٤﴾ مِن دُونِهِۦ ۖ فَكِيدُونِى
جَمِيعًا ثُمَّ لَا تُنظِرُونِ ﴿٥٥﴾ إِنِّى تَوَكَّلْتُ عَلَى ٱللَّهِ رَبِّى وَرَبِّكُم ۚ مَّا
مِن دَآبَّةٍ إِلَّا هُوَ ءَاخِذٌۢ بِنَاصِيَتِهَآ ۚ إِنَّ رَبِّى عَلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ
﴿٥٦﴾ فَإِن تَوَلَّوْا۟ فَقَدْ أَبْلَغْتُكُم مَّآ أُرْسِلْتُ بِهِۦٓ إِلَيْكُمْ ۚ وَيَسْتَخْلِفُ
رَبِّى قَوْمًا غَيْرَكُمْ وَلَا تَضُرُّونَهُۥ شَيْـًٔا ۚ إِنَّ رَبِّى عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ حَفِيظٌ
﴿٥٧﴾ وَلَمَّا جَآءَ أَمْرُنَا نَجَّيْنَا هُودًا وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ مَعَهُۥ بِرَحْمَةٍ
مِّنَّا وَنَجَّيْنَٰهُم مِّنْ عَذَابٍ غَلِيظٍ ﴿٥٨﴾ وَتِلْكَ عَادٌ ۖ جَحَدُوا۟ بِـَٔايَٰتِ
رَبِّهِمْ وَعَصَوْا۟ رُسُلَهُۥ وَٱتَّبَعُوٓا۟ أَمْرَ كُلِّ جَبَّارٍ عَنِيدٍ ﴿٥٩﴾ وَأُتْبِعُوا۟
فِى هَٰذِهِ ٱلدُّنْيَا لَعْنَةً وَيَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ ۗ أَلَآ إِنَّ عَادًا كَفَرُوا۟ رَبَّهُمْ ۗ أَلَا
بُعْدًا لِّعَادٍ قَوْمِ هُودٍ ﴿٦٠﴾ ۞ وَإِلَىٰ ثَمُودَ أَخَاهُمْ صَٰلِحًا ۚ قَالَ
يَٰقَوْمِ ٱعْبُدُوا۟ ٱللَّهَ مَا لَكُم مِّنْ إِلَٰهٍ غَيْرُهُۥ ۖ هُوَ أَنشَأَكُم مِّنَ ٱلْأَرْضِ
وَٱسْتَعْمَرَكُمْ فِيهَا فَٱسْتَغْفِرُوهُ ثُمَّ تُوبُوٓا۟ إِلَيْهِ ۚ إِنَّ رَبِّى قَرِيبٌ مُّجِيبٌ
﴿٦١﴾ قَالُوا۟ يَٰصَٰلِحُ قَدْ كُنتَ فِينَا مَرْجُوًّا قَبْلَ هَٰذَآ ۖ أَتَنْهَىٰنَآ أَن
نَّعْبُدَ مَا يَعْبُدُ ءَابَآؤُنَا وَإِنَّنَا لَفِى شَكٍّ مِّمَّا تَدْعُونَآ إِلَيْهِ مُرِيبٍ ﴿٦٢﴾



(٥٤) ئێمە هیچ نالّێین ئەوە نەبێت: وا دیارە هەندێ لە خواکانمان بەخراپ دەستیان لێ وەشاندوویت!! هود وتی: دەی من بەراستی خوا دەکەم بەشایەت و ئێوەش بەشایەت بن کە بێگومان من بەریم لەوەی ئێوە دەیکەنە شەریک و هاوەڵ بۆ خوا...

(٥٥) جگە لە خوا خۆتان بە پەرستراوەکانتانەوە فێڵ و پیلانم لێ بکەن هەمووتان، کەوابوو وەرن هەمووتان کۆببنەوە و نەخشە بکێشن بۆ لەناو بردنم، پاشان مۆڵەتیشم مەدەن!. . .

(٥٦) چونکە بەراستی من پشتم بەخوا بەستووە، کە پەروەردگاری من و پەروەردگاری ئێوەیشە، هیچ گیانلەبەرێک نیە جڵەوی بەدەست خوای گەورەوە نەبێت، بێگومان پەروەردگارم لەسەر بەرنامەو ڕێبازێکی ڕاست و دروستە.

(٥٧) جا ئەگەر ئێوە گوێم بۆ نەگرن و پشت بکەنە ئەم بەرنامەیە، ئەوە بێگومان من پێم ڕاگەیاندن ئەو بەرنامە و پەیامە خواییەی بە مندا نێرراوە بۆتان و پەروەردگارم (ئەگەر ملکەچ نەبن) ئێوە لەناو دەبات و هۆزێکی تر دەخاتە شوێنی ئێوە، ئێوە ناتوانن هیچ زیانێک بەو بگەیەنن بەراستی پەروەردگاری من بەسەر هەموو شتێکدا چاودێرو بە توانایە.

(٥٨) کاتێکیش فەرمانی ئێمە هات (کە بڕیاری تیاچوونی هۆزی عاد بوو)، ئەوە هود و ئەوانەی بڕوایان هێنابوو لەگەڵ ئەودا بوون ڕزگاریشمان کردن بەهۆی بەزەیی و لێبووردەیی خۆمانەوە لە سزایەکی زۆر قورس و گران.

(٥٩) بەڵێ! ئەوە هۆزی عاد بوو، بێ باوەڕ بوون و ئیمانیان نەهێنا بە فەرمانەکانی پەروەردگاریان، لاشیاندا لە بەرنامەی پێغەمبەرانی خواو شوێن فەرمانی هەموو زۆرداری سەرسەخت و خوانەناسێک کەوتن.

(٦٠) جا هەر لەم جیهانەدا نەفرین لێکراو بوون و دوور بوون لە بەزەیی خوا، لە ڕۆژی قیامەتیشدا (هەر نەفرین لێکراو دەبن)و ئاگاداربن کە بێگومان هۆزی عاد بێ باوەڕ بوون و بێ وەفاییان دەربڕی بەرامبەر پەروەردگاریان، ئاگاداربن کە دووریی و بێنرخی بۆ هۆزی عادی قەومی هود.

(٦١) بۆ هۆزی ثمودیش، صالح ی برایانمان ڕەوانە کرد، وتی: ئەی خزمەکانم گوێڕایەڵی خوای گەورە بکەن جگە لەو زاتە هیچ خوایەکی ترتان نیە، ئەو بەرپای کردوون لە زەویداو داوای لێکردوون کە ئاوەدانی بکەنەوە، جا کەوابوو داوای لێ خۆشبوونی لێ بکەن پاشان بگەڕێنەوە بۆ لای و فەرمانەکانی بەجێ بهێنن، چونکە بەراستی پەروەردگاری من زۆر نزیکە و نزا وەرگرە (لەو کەسانەی لێی دەپاڕێنەوە و داوای لێ خۆشبوونی لێدەکەن).

(٦٢) خەڵکەکە وتیان: ئەی صالح، بەڕاستی پێش ئەم باسانەت تۆ لەناو ئێمەدا شوێنی هیوامان بوویت، ئایا بەرگری ئەوەمان لێدەکەیت کە شوێن شتێک بکەوین کە باوو باپیرانمان شوێنی کەوتوون و پەرستویانن؟! ئێمە بەڕاستی لە گوماندایین لەوەی کە تۆ بانگی ئێمە دەکەی بۆلای و بەدبینین لێی!!

قَالَ يَٰقَوْمِ أَرَءَيْتُمْ إِن كُنتُ عَلَىٰ بَيِّنَةٍ مِّن رَّبِّى وَءَاتَىٰنِى
مِنْهُ رَحْمَةً فَمَن يَنصُرُنِى مِنَ ٱللَّهِ إِنْ عَصَيْتُهُۥ فَمَا تَزِيدُونَنِى
غَيْرَ تَخْسِيرٍ ﴿٦٣﴾ وَيَٰقَوْمِ هَٰذِهِۦ نَاقَةُ ٱللَّهِ لَكُمْ ءَايَةً
فَذَرُوهَا تَأْكُلْ فِىٓ أَرْضِ ٱللَّهِ وَلَا تَمَسُّوهَا بِسُوٓءٍ فَيَأْخُذَكُمْ
عَذَابٌ قَرِيبٌ ﴿٦٤﴾ فَعَقَرُوهَا فَقَالَ تَمَتَّعُوا۟ فِى دَارِكُمْ
ثَلَٰثَةَ أَيَّامٍ ذَٰلِكَ وَعْدٌ غَيْرُ مَكْذُوبٍ ﴿٦٥﴾ فَلَمَّا جَآءَ
أَمْرُنَا نَجَّيْنَا صَٰلِحًا وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ مَعَهُۥ بِرَحْمَةٍ مِّنَّا
وَمِنْ خِزْىِ يَوْمِئِذٍ إِنَّ رَبَّكَ هُوَ ٱلْقَوِىُّ ٱلْعَزِيزُ ﴿٦٦﴾ وَأَخَذَ
ٱلَّذِينَ ظَلَمُوا۟ ٱلصَّيْحَةُ فَأَصْبَحُوا۟ فِى دِيَٰرِهِمْ جَٰثِمِينَ
﴿٦٧﴾ كَأَن لَّمْ يَغْنَوْا۟ فِيهَآ أَلَآ إِنَّ ثَمُودَا۟ كَفَرُوا۟ رَبَّهُمْ أَلَا بُعْدًا
لِّثَمُودَ ﴿٦٨﴾ وَلَقَدْ جَآءَتْ رُسُلُنَآ إِبْرَٰهِيمَ بِٱلْبُشْرَىٰ قَالُوا۟
سَلَٰمًا قَالَ سَلَٰمٌ فَمَا لَبِثَ أَن جَآءَ بِعِجْلٍ حَنِيذٍ ﴿٦٩﴾ فَلَمَّا
رَءَآ أَيْدِيَهُمْ لَا تَصِلُ إِلَيْهِ نَكِرَهُمْ وَأَوْجَسَ مِنْهُمْ خِيفَةً
قَالُوا۟ لَا تَخَفْ إِنَّآ أُرْسِلْنَآ إِلَىٰ قَوْمِ لُوطٍ ﴿٧٠﴾ وَٱمْرَأَتُهُۥ قَآئِمَةٌ
فَضَحِكَتْ فَبَشَّرْنَٰهَا بِإِسْحَٰقَ وَمِن وَرَآءِ إِسْحَٰقَ يَعْقُوبَ ﴿٧١﴾

(٦٣) صاڵح وتی: ئەی خزمەکانم هەواڵم بدەنێ: ئەگەر من لەسەر ڕێگە و بەرنامەیەکی ڕاست و دروست بم لەلایەن پەروەردگارمەوە و خێرو چاکەو بەزەیی خۆی پێ بەخشی بم لە خۆیەوە و ڕەحمەتی تایبەتیشی پێ بەخشیووم، باشە کێ یارمەتیم دەدات و لە سزای خوا ڕزگارم دەکات ئەگەر لە فەرمانی لابدەم و پەیامەکەیم بە ڕێک و تەواوی نەگەیاند، جا ئێوە بەم هەڵوێستەتان جگە لە خسارەتمەندیی بۆ من هیچ سوودێکی ترم پێناگەیەنن.

(٦٤) ئەی خزمەکانم ئەمە ووشترەکەیە کە لەلایەن خواوە کراوە بە موعجیزە و نیشانەیەکی تایبەت (لەسەر دەسەڵاتی خۆی و ڕاستی پێغەمبەرێتی من)و جا وازی لێ بهێنن با لە زەوی خوادا بلەوەڕێت، بەنیازی خراپەوە دەستی بۆ نەبەن، ئەگینا سزایەکی نزیک دەتانگرێت.

(٦٥) یەکسەرچوون سەریان بڕی، جا (صالح) یش پێی وتن: ڕابوێرن لە ماڵ و مەنزڵی خۆتاندا بۆ ماوەی سێ ڕۆژ، (دوای ئەو ماوە دیاری کراوە تیادەچن)و ئەوەش پەیمانێکە و هەرگیز بەدرۆ ناخرێتەوە.

(٦٦) جا کاتێک فەرمانی ئێمە هات و بڕیاردرا لەکاتی دیاری کراودا و ئەوە صالح و ئەوانەی بڕوایان هێنابوو لەگەڵیدا ڕزگارمان کردن بە میهرەبانی و بەزەیی خۆمان، لە سەرشۆڕیی ئەو ڕۆژەش پەناماندان، بەڕاستی پەروەردگارت هەر خۆی خاوەنی هێزە و باڵادەستە.

(٦٧) جا ئەو دەنگە سامناکەی بووە هۆی تیاچوونیان هەموو ئەوانەی گرت کە تاوان و ستەمیان کردو فەرمانبەرداری پەروەردگاریان نەبوون، سەرەنجام هەموویان لە شوێنەکانی خۆیاندا کەوتن بەڕووی زەویدا و تیاچوون لە بەرەبەیاندا...

(٦٨) وەک ئەوەی کە هەر لەو شوێنەدا نەبووبن و تیایدا نەژیابن، ئاگادارین، بەڕاستی هۆزی ثمود بێ بڕوا بوون بە پەروەردگاریان و بێ وەفا بوون بەرامبەری، ئاگاداربن بڕیاری دووری لە بەزەیی خوا، درا بۆ هۆزی ثمودیش.

(٦٩) سوێند بەخوا بێگومان وەفدێکی ڕەوانە کراوی ئێمە (لە فریشتە) هاتنە لای ئیبراهیم بە مژدەوە (مژدەی بوونی منداڵێک)و ووتیان: سڵاوی خوات لێ بێت، ئەمیش وتی: سڵاوی خوا لە ئێوەش، دوای بەخێرهاتنیان ڕۆیشت و جا زۆری پێ نەچوو گەڕایەوە بەگۆشتی گوێرەکەیەکی برژاوەوە.

(٧٠) جا کاتێک (ئیبراهیم) بینی دەستی بۆ نابەن ، کارەکەیانی بە نائاسایی دانا و لەدڵی خۆیدا لێیان ترسا ، ئەوانیش هەستیان پێکردو وتیان: مەترسە، بەڕاستی ئێمە نێردراوین بۆ لای قەومەکەی لوط.

(٧١) لەو کاتەدا خێزانەکەی وەستابوو، یەکسەر پێکەنی، جا (خوای گەورە فەرمووی): ئێمەش مژدەمان دایە کەئیسحاقت پێدەبەخشین و لە دوای ئەویش یەعقوب، لە نەوەی ئیسحاق دێتە دنیاوە.

قَالَتْ يَٰوَيْلَتَىٰٓ ءَأَلِدُ وَأَنَا۠ عَجُوزٌ وَهَٰذَا بَعْلِى شَيْخًا ۖ إِنَّ هَٰذَا
لَشَىْءٌ عَجِيبٌ ﴿٧٢﴾ قَالُوٓا۟ أَتَعْجَبِينَ مِنْ أَمْرِ ٱللَّهِ ۖ رَحْمَتُ ٱللَّهِ
وَبَرَكَٰتُهُۥ عَلَيْكُمْ أَهْلَ ٱلْبَيْتِ ۚ إِنَّهُۥ حَمِيدٌ مَّجِيدٌ ﴿٧٣﴾ فَلَمَّا ذَهَبَ
عَنْ إِبْرَٰهِيمَ ٱلرَّوْعُ وَجَآءَتْهُ ٱلْبُشْرَىٰ يُجَٰدِلُنَا فِى قَوْمِ لُوطٍ ﴿٧٤﴾
إِنَّ إِبْرَٰهِيمَ لَحَلِيمٌ أَوَّٰهٌ مُّنِيبٌ ﴿٧٥﴾ يَٰٓإِبْرَٰهِيمُ أَعْرِضْ عَنْ هَٰذَآ ۖ إِنَّهُۥ
قَدْ جَآءَ أَمْرُ رَبِّكَ ۖ وَإِنَّهُمْ ءَاتِيهِمْ عَذَابٌ غَيْرُ مَرْدُودٍ ﴿٧٦﴾ وَلَمَّا
جَآءَتْ رُسُلُنَا لُوطًا سِىٓءَ بِهِمْ وَضَاقَ بِهِمْ ذَرْعًا وَقَالَ هَٰذَا
يَوْمٌ عَصِيبٌ ﴿٧٧﴾ وَجَآءَهُۥ قَوْمُهُۥ يُهْرَعُونَ إِلَيْهِ وَمِن قَبْلُ كَانُوا۟
يَعْمَلُونَ ٱلسَّيِّـَٔاتِ ۚ قَالَ يَٰقَوْمِ هَٰٓؤُلَآءِ بَنَاتِى هُنَّ أَطْهَرُ لَكُمْ ۖ
فَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَلَا تُخْزُونِ فِى ضَيْفِىٓ ۖ أَلَيْسَ مِنكُمْ رَجُلٌ رَّشِيدٌ
﴿٧٨﴾ قَالُوا۟ لَقَدْ عَلِمْتَ مَا لَنَا فِى بَنَاتِكَ مِنْ حَقٍّ وَإِنَّكَ لَتَعْلَمُ مَا نُرِيدُ
﴿٧٩﴾ قَالَ لَوْ أَنَّ لِى بِكُمْ قُوَّةً أَوْ ءَاوِىٓ إِلَىٰ رُكْنٍ شَدِيدٍ ﴿٨٠﴾ قَالُوا۟
يَٰلُوطُ إِنَّا رُسُلُ رَبِّكَ لَن يَصِلُوٓا۟ إِلَيْكَ ۖ فَأَسْرِ بِأَهْلِكَ بِقِطْعٍ
مِّنَ ٱلَّيْلِ وَلَا يَلْتَفِتْ مِنكُمْ أَحَدٌ إِلَّا ٱمْرَأَتَكَ ۖ إِنَّهُۥ مُصِيبُهَا
مَآ أَصَابَهُمْ ۚ إِنَّ مَوْعِدَهُمُ ٱلصُّبْحُ ۚ أَلَيْسَ ٱلصُّبْحُ بِقَرِيبٍ ﴿٨١﴾

(٧٢) خێزانی ئیبراهیم وتی: وەی رۆ (شەرمەزار خۆم)! چۆن منداڵم دەبێت من پیرم و ئەمەش مێردەکەمە، پیر و بەساڵا چووە، بەراستی ئەمە شتێکی سەر سوڕهێنەرە!

(٧٣) فریشتەکان وتیان: ئایا سەرسام دەبیت لە فەرمان ؟ کاری خوا ؟! رەحمەت و بەرەکەتی خواتان لەسەربێت ئەی خێزانی ئەم ماڵە پیرۆزە، (بێگومان خوای گەورە کاری وا دەکات)و چونکە هەمیشە ئەو زاتە سوپاسکراوە و خاوەنی بەرزی و دەسەڵاتیشە.

(٧٤) جاکاتێک ترسەکە لە دڵی ئیبراهیم دەرچوو (هێمن بۆوە)و مژدەکەشی بۆ هاتبوو، ئینجا دەستی کرد بە باس کردن و موجادەلە دەربارەی قەومی (لوط).

(٧٥) بەڕاستی ئیبراهیم زۆر لەسەرخۆ و بە ئارام و خەمخۆر و گەڕاوەیە بۆ لای خوا.

(٧٦) (فریشتەکان وتیان): ئەی ئیبراهیم واز بهێنە لەو باس و کێشەیە، دڵنیابە بەڕاستی پەروەردگارت فەرمانی داوە و(کار تەواو بووە)و بێگومان سزایەکیان بۆ هاتووە کە ناگەڕێتەوە.

(٧٧) کاتێکیش وەفدی فریشتەکانی ئێمە هاتنە لای لوط، ناڕەحەت بوو پێیان، زۆر دڵتەنگ بوو (چونکە لە شێوەی چەند لاوێکی پێکەوتوودا هاتبوون، لەدڵی خۆیدا) وتی: ئەمە رۆژێکی سەختە (منی تێکەوتووم).

(٧٨) هۆزەکەشی بەبیستنی هاتنی ئەم میوانانە، بەپەلەو بێ شەرمانە کشان بۆ لای، پێشتریش کردارە خراپەکانیان دەکرد، (کاتێک لوط ئەم دیمەنە ناشیرینەی بینی) وتی: ئەی خزمەکانم ئائەوانە کچەکانمن و ئەوان پاک و خاوێنن بۆ ئێوە (وەرن لەناو هۆزدا کێتان بە دڵە بەشێوەیەکی شەرعی و ڕەوا لێتان مارە بکەم) جا لە خوا بترسن و شەرمەزارم مەکەن لەناو میوانەکانمدا، ئایا پیاوێکی ژیرو مەردتان تێدا نیە (کە لە کاری ناڕەوای ئاوا جڵەوگیری بکات)؟!

(٧٩) ئەوانیش بێ شەرمانە وتیان: سوێند بەخوا بەراستی تۆ دەزانیت ئێمە هیچ حەقێکمان نیە بەکچەکانی تۆوە، بێگومان تۆش دەزانیت ئێمە چیمان دەوێت!

(٨٠) لوط وتی: خۆزگە بەڕاستی هێزێکم دەبوو لە خۆتان (بۆ بەرامبەری ناپاکەکانتان) یان پەنایەکی بەهێزم دەست دەکەوت و دەڕۆیشتم بۆی (تا تۆڵەتان لێ بکەمەوە و تەمێتان بکەم).

(٨١) میوانەکان وتیان: ئەی لوط بەڕاستی ئێمە فریشتەی نێرراوی پەروەردگاری تۆین، ئەو تاوانبارانە هەرگیز ناگەنە لات (تابتوانن دەستدرێژی بکەنە سەر ئێمە)و جا تۆ خاوو خێزانت لەبەشێکی شەودا دەربکەو کەس لە ئێوە لانەکاتەوە و ئاوڕ نەداتەوە، جگە هاوسەرەکەت (کە لاسارەو بەگوێت ناکات) چونکە بەراستی ئەو سزایەی کە تاوانبارانی گرتۆتەوە ئەویش دەگرێتەوە، بەڕاستی کاتی سزاکەشیان لە بەرەبەیاندایە، ئایا بەرەبەیانی ئەمشەو نزیک نییە؟!



فَلَمَّا جَآءَ أَمْرُنَا جَعَلْنَا عَٰلِيَهَا سَافِلَهَا وَأَمْطَرْنَا عَلَيْهَا حِجَارَةً مِّن سِجِّيلٍ مَّنضُودٍ ﴿٨٢﴾ مُّسَوَّمَةً عِندَ رَبِّكَ وَمَا هِيَ مِنَ ٱلظَّٰلِمِينَ بِبَعِيدٍ ﴿٨٣﴾ ۞ وَإِلَىٰ مَدْيَنَ أَخَاهُمْ شُعَيْبًا قَالَ يَٰقَوْمِ ٱعْبُدُوا۟ ٱللَّهَ مَا لَكُم مِّنْ إِلَٰهٍ غَيْرُهُۥ وَلَا تَنقُصُوا۟ ٱلْمِكْيَالَ وَٱلْمِيزَانَ إِنِّىٓ أَرَىٰكُم بِخَيْرٍ وَإِنِّىٓ أَخَافُ عَلَيْكُمْ عَذَابَ يَوْمٍ مُّحِيطٍ ﴿٨٤﴾ وَيَٰقَوْمِ أَوْفُوا۟ ٱلْمِكْيَالَ وَٱلْمِيزَانَ بِٱلْقِسْطِ وَلَا تَبْخَسُوا۟ ٱلنَّاسَ أَشْيَآءَهُمْ وَلَا تَعْثَوْا۟ فِى ٱلْأَرْضِ مُفْسِدِينَ ﴿٨٥﴾ بَقِيَّتُ ٱللَّهِ خَيْرٌ لَّكُمْ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ وَمَآ أَنَا۠ عَلَيْكُم بِحَفِيظٍ ﴿٨٦﴾ قَالُوا۟ يَٰشُعَيْبُ أَصَلَوٰتُكَ تَأْمُرُكَ أَن نَّتْرُكَ مَا يَعْبُدُ ءَابَآؤُنَآ أَوْ أَن نَّفْعَلَ فِىٓ أَمْوَٰلِنَا مَا نَشَٰٓؤُا۟ إِنَّكَ لَأَنتَ ٱلْحَلِيمُ ٱلرَّشِيدُ ﴿٨٧﴾ قَالَ يَٰقَوْمِ أَرَءَيْتُمْ إِن كُنتُ عَلَىٰ بَيِّنَةٍ مِّن رَّبِّى وَرَزَقَنِى مِنْهُ رِزْقًا حَسَنًا وَمَآ أُرِيدُ أَنْ أُخَالِفَكُمْ إِلَىٰ مَآ أَنْهَىٰكُمْ عَنْهُ إِنْ أُرِيدُ إِلَّا ٱلْإِصْلَٰحَ مَا ٱسْتَطَعْتُ وَمَا تَوْفِيقِىٓ إِلَّا بِٱللَّهِ عَلَيْهِ تَوَكَّلْتُ وَإِلَيْهِ أُنِيبُ ﴿٨٨﴾

(٨٢) جا کاتێک فەرمانی ئێمە بۆ تیاچوونیان هات، شارۆچکەکەیانمان ژێرە و ژوور کرد و بە قوڕی سوورەوە کراوی وەک بەرد، چین لەسەر چین بەرد بارانمان کرد.

(٨٣) هەموو ئەو بەردانە دیاری کراو بوون، لە لایەن پەروەردگارتەوە (کە بەدات بەسەر تەوقە سەری کێدا) ئەم کارەسات و ئەم بەرد بارانەش وەنەبێت زۆر دوور بێت لە ستەمکارانەوە (لە هەموو سەردەمێکدا، کاتێک رۆدەچن لە تاوانکاریدا).

(٨٤) بۆ لای خەڵکی مەدیەنیش براو کەسی خۆیان (شوعەیب) مان بە پێغەمبەرێتی رەوانەکرد، ئەویش وتی: ئەی خزمەکانم بەندایەتی خوا بکەن، هیچ خوایەکی ترتان نیە جگە لەو، هەروەها کەم و کوورپیش مەکەن لە پێوانەو کێشانەدا، بەڕاستی من بەچاک دەتانبینم و رزق و رۆزیتان باشەو لە خۆشیدان، بێگومان من دەترسم ئەگەر لە فەرمانی خوا دەرچن ئێوە تووشی سزای رۆژێک ببن کە گەمارۆتان بدات و لێی رزگار نەبن.

(٨٥) ئەی قەوم و خزمەکانم، با پێوان و کێشانتان تێرو تەواوبێت و بە دادپەروەرانە ئەنجامی بدەن، شتومەکی خەڵکی کەم نرخ مەکەن و (فێڵیان لێ مەکەن)و خراپەکاری مەکەن لە زەویدا و تۆوی خراپە مەچێنن.

(٨٦) ئەوەی خوای گەورە بۆتان دەهێڵێتەوە لە قازانج وحەڵاڵی کردووە بۆتان، ئەوە چاکترە لە زۆرێکی حەرام، ئەگەر ئێوە ئیماندار بن، منیش لێپرسراو نیم بەرامبەر ئێوە (بەڵکو حق و راستیتان پێ رادەگەیەنم).

(٨٧) خەڵکەکە وتیان: ئەی شوعەیب، ئایا نوێژەکەت فەرمانت پێدەکات کە ئێمە واز بهێنین لەوەی باوو باپیرانمان پەرستوویانن، یاخود لە ماڵ و سامانماندا بەئارەزووی خۆمان چیمان بوێت بیکەین و بەڕاستی تۆ زۆرهێمن و خاوەن ژیریت؟! (وادیارە گاڵتەیان پێکردووە، یان قەناعەتیان بەژیری و لەسەرخۆیی بووە و سەریان سوڕماوە لەوەی کە دەیەوێت لە داب و نەریتی باوو باپیران دەربچێت).

(٨٨) شوعەیب وتی: ئەی قەوم و خزمەکانم هەواڵم بدەنێ ئەگەر منتان بینی و بۆتان دەرکەوت کە لەسەر بەرنامەیەکی رێک و رۆشنم لەلایەن پەروەردگارمەوە و هەر لەلایەن خۆشیەوە رزق و رۆزی جوان و باشی داومەتێ، منیش نامەوێت قەدەغەی شتێکتان لێ بکەم، کەچی خۆم وەک ئێوە نەکەم (چی بە ئێوە بگەیەنم خۆم لە پێشدا ئەنجامی دەدەم) من هیچم ناوێت تەنها چاکسازی نەبێت، بەگوێرەی توانام، رێکخستنی کارم بەدەستی کەس نیە بەدەستی خوا نەبێت، پشت و پەنام هەر بەو بەستووە و هەر بۆ لای ئەویش دەگەڕێمەوە.

وَيَا قَوْمِ لَا يَجْرِمَنَّكُمْ شِقَاقِي أَن يُصِيبَكُم مِّثْلُ مَا أَصَابَ قَوْمَ نُوحٍ أَوْ قَوْمَ هُودٍ أَوْ قَوْمَ صَالِحٍ ۚ وَمَا قَوْمُ لُوطٍ مِّنكُم بِبَعِيدٍ ﴿٨٩﴾ وَاسْتَغْفِرُوا رَبَّكُمْ ثُمَّ تُوبُوا إِلَيْهِ ۚ إِنَّ رَبِّي رَحِيمٌ وَدُودٌ ﴿٩٠﴾ قَالُوا يَا شُعَيْبُ مَا نَفْقَهُ كَثِيرًا مِّمَّا تَقُولُ وَإِنَّا لَنَرَاكَ فِينَا ضَعِيفًا ۖ وَلَوْلَا رَهْطُكَ لَرَجَمْنَاكَ ۖ وَمَا أَنتَ عَلَيْنَا بِعَزِيزٍ ﴿٩١﴾ قَالَ يَا قَوْمِ أَرَهْطِي أَعَزُّ عَلَيْكُم مِّنَ اللَّهِ وَاتَّخَذْتُمُوهُ وَرَاءَكُمْ ظِهْرِيًّا ۖ إِنَّ رَبِّي بِمَا تَعْمَلُونَ مُحِيطٌ ﴿٩٢﴾ وَيَا قَوْمِ اعْمَلُوا عَلَىٰ مَكَانَتِكُمْ إِنِّي عَامِلٌ ۖ سَوْفَ تَعْلَمُونَ مَن يَأْتِيهِ عَذَابٌ يُخْزِيهِ وَمَنْ هُوَ كَاذِبٌ ۖ وَارْتَقِبُوا إِنِّي مَعَكُمْ رَقِيبٌ ﴿٩٣﴾ وَلَمَّا جَاءَ أَمْرُنَا نَجَّيْنَا شُعَيْبًا وَالَّذِينَ آمَنُوا مَعَهُ بِرَحْمَةٍ مِّنَّا وَأَخَذَتِ الَّذِينَ ظَلَمُوا الصَّيْحَةُ فَأَصْبَحُوا فِي دِيَارِهِمْ جَاثِمِينَ ﴿٩٤﴾ كَأَن لَّمْ يَغْنَوْا فِيهَا ۗ أَلَا بُعْدًا لِّمَدْيَنَ كَمَا بَعِدَتْ ثَمُودُ ﴿٩٥﴾ وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا مُوسَىٰ بِآيَاتِنَا وَسُلْطَانٍ مُّبِينٍ ﴿٩٦﴾ إِلَىٰ فِرْعَوْنَ وَمَلَئِهِ فَاتَّبَعُوا أَمْرَ فِرْعَوْنَ ۖ وَمَا أَمْرُ فِرْعَوْنَ بِرَشِيدٍ ﴿٩٧﴾

(٨٩) ئەی قەوم و خزمانم ناکۆکی و دژایەتیتان لەگەڵ مندا، واتان لێ نەکات (ئەو ئایین و بیرو باوەڕەی هێناومە لەلایەن خواوە بەدرۆی بزانن و)جا ئەو کاتە ئەوەی تووشی هۆزی نوح و هود و صالح بوو تووشی ئێوەش ببێت، خۆ هۆزی لوط لێتانەوە زۆر دوور نیە.

(٩٠) داوای لێ خۆشبوونیش لە پەروەردگارتان بکەن و واز بهێنن لە تاوان و خراپەکاری و پاشان بگەڕێنەوە بۆ لای خوا، بێگومان پەروەردگاری من زۆر بەبەزەیی و میهرەبانە، زۆر بەسۆز و دڵۆڤانە.

(٩١) خزمانی ناڵەبار وتیان: ئەی شوعەیب، ئێمە تێناگەین لە زۆربەی ئەو باسانەی کە تۆ دەیڵێیت، ئێمەش بەڕاستی تۆ بەلاواز دەبینین لەناو خۆماندا (وادەزانین ناتوانیت بەرەنگاری ئەم هەموو خەڵکە بکەیت، ئەمەی تۆ باسی دەکەیت پێویستی بەهێزو توانایەکی زۆر هەیە)و خۆ ئەگەر خزمەکانت نەبوایە بەرد بارانمان دەکردیت، وەنەبێت تۆ هیچ توانا و دەسەڵاتێکت هەبێت بەسەرماندا.

(٩٢) شوعەیب وتی: ئەی هۆزو خزمانم ئایا کەس و کارم بەلای ئێوەوە بە توانا و دەسەڵاتدارترە لە خوا؟! لەکاتێکدا ئەو زاتەتان فەرامۆش کردووە و گوێ نادەن بە فەرمانەکانی، بەڕاستی پەروەردگارم ئاگادارە بەوەی ئێوە ئەنجامی دەدەن.

(٩٣) ئەی هۆزو خزمانم ئێوە کاری خۆتان بکەن چەندە تواناتان هەیە، منیش کاری خۆم لەسەر بەرنامەی خۆم ئەنجام دەدەم، لەمەولا دەردەکەوێت و دەزانن کێ سزای بۆ دێت و سەرشۆڕی دەکات، کێش درۆزنە، ئێوە چاوەڕێ بن بەڕاستی منیش لەگەڵتاندا چاوەڕێم.

(٩٤) کاتێکیش فەرمانی ئێمە هات بۆ تیاچوونیان، شوعەیب و ئەوانەی بڕوایان هێنابوو لەگەڵیدا بەهۆی بەزەیی و لوتفی خۆمان ڕزگارمان کردن و دەنگ و نرکەی تیاچوون تاوانکارو بێ بڕواکانی گرتەوە و جا هەموویان لە شوێن و جێگەی خۆیاندا تیاچوون و بەچۆکدا هاتن لە بەرەبەیاندا.

(٩٥) هەروەک لەوێ نەژیابن، ئاگاداربن، دەک مەدیەن لەوەولاتر بچێت هەروەک ثمود لەوەولاتر چوو.

(٩٦) سوێندیش بێت بێگومان موسا پێغەمبەرمان نارد بەچەندەها بەڵگە و فەرمانی دروستەوە، هاوڕێ لەگەڵ موعجیزە و شتی سەرسوڕهێنەری ئاشکرادا...

(٩٧) بۆ لای فیرعەون و دارو دەستەی، کەچی خەڵکەکە شوێن فەرمانی فیرعەون کەوتن، لەکاتێکیشدا کە کارو فەرمانی فیرعەون هەرگیز ڕاست و دروست و ژیرانە نەبوو (بەڵکو ستەمکار بوو خۆی بەخوا دەدایە قەڵەم)!...

يَقْدُمُ قَوْمَهُۥ يَوْمَ ٱلْقِيَـٰمَةِ فَأَوْرَدَهُمُ ٱلنَّارَ ۖ وَبِئْسَ ٱلْوِرْدُ ٱلْمَوْرُودُ ﴿٩٨﴾ وَأُتْبِعُوا۟ فِى هَـٰذِهِۦ لَعْنَةً وَيَوْمَ ٱلْقِيَـٰمَةِ ۚ بِئْسَ ٱلرِّفْدُ ٱلْمَرْفُودُ ﴿٩٩﴾ ذَٰلِكَ مِنْ أَنۢبَآءِ ٱلْقُرَىٰ نَقُصُّهُۥ عَلَيْكَ ۖ مِنْهَا قَآئِمٌ وَحَصِيدٌ ﴿١٠٠﴾ وَمَا ظَلَمْنَـٰهُمْ وَلَـٰكِن ظَلَمُوٓا۟ أَنفُسَهُمْ ۖ فَمَآ أَغْنَتْ عَنْهُمْ ءَالِهَتُهُمُ ٱلَّتِى يَدْعُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ مِن شَىْءٍ لَّمَّا جَآءَ أَمْرُ رَبِّكَ ۖ وَمَا زَادُوهُمْ غَيْرَ تَتْبِيبٍ ﴿١٠١﴾ وَكَذَٰلِكَ أَخْذُ رَبِّكَ إِذَآ أَخَذَ ٱلْقُرَىٰ وَهِىَ ظَـٰلِمَةٌ ۚ إِنَّ أَخْذَهُۥٓ أَلِيمٌ شَدِيدٌ ﴿١٠٢﴾ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَـَٔايَةً لِّمَنْ خَافَ عَذَابَ ٱلْـَٔاخِرَةِ ۚ ذَٰلِكَ يَوْمٌ مَّجْمُوعٌ لَّهُ ٱلنَّاسُ وَذَٰلِكَ يَوْمٌ مَّشْهُودٌ ﴿١٠٣﴾ وَمَا نُؤَخِّرُهُۥٓ إِلَّا لِأَجَلٍ مَّعْدُودٍ ﴿١٠٤﴾ يَوْمَ يَأْتِ لَا تَكَلَّمُ نَفْسٌ إِلَّا بِإِذْنِهِۦ ۚ فَمِنْهُمْ شَقِىٌّ وَسَعِيدٌ ﴿١٠٥﴾ فَأَمَّا ٱلَّذِينَ شَقُوا۟ فَفِى ٱلنَّارِ لَهُمْ فِيهَا زَفِيرٌ وَشَهِيقٌ ﴿١٠٦﴾ خَـٰلِدِينَ فِيهَا مَا دَامَتِ ٱلسَّمَـٰوَٰتُ وَٱلْأَرْضُ إِلَّا مَا شَآءَ رَبُّكَ ۚ إِنَّ رَبَّكَ فَعَّالٌ لِّمَا يُرِيدُ ﴿١٠٧﴾ ۞ وَأَمَّا ٱلَّذِينَ سُعِدُوا۟ فَفِى ٱلْجَنَّةِ خَـٰلِدِينَ فِيهَا مَا دَامَتِ ٱلسَّمَـٰوَٰتُ وَٱلْأَرْضُ إِلَّا مَا شَآءَ رَبُّكَ ۖ عَطَآءً غَيْرَ مَجْذُوذٍ ﴿١٠٨﴾



(٩٨) لە ڕۆژی قیامەتیشدا فیرعەون پێش قەوم و شوێنکەوتووانی دەکەوێت و ئینجا دەیانباتە ناو ئاگری دۆزەخ، ئای چەند خراپە ئەو چوونە ژوورەوەیە و ئەو شوێنەی دەچنە ناوی.

(٩٩) ئەوانە لەم دنیادا نەفرین و دەنگوباسی خراپ شوێنیشیان خرا، لە ڕۆژی قیامەتیشدا، (بەشیان هەر دووریە لەرەحم و بەزەیی خوا)و ئای چەند خراپە ئەو بەخشینەی پێیان بەخشراوە.

(١٠٠) ئەوەی کە باسکرا هەندێک بوو لە هەواڵی خەڵکی ئەو شارو شارۆچکانە، بۆت دەگێڕینەوە، هەندێک لەو شارو دێهاتانە ماون و هەندێکی تری بەتەواوی وێران بوون.

(١٠١) ئێمە ستەممان لێنەکردن و بەڵکو هەر خۆیان ستەمیان لە خۆیان کرد، ئەوسا ئەو پەرستراوانەیان کە لەجیاتی خوا هاواریان لێ دەکردن، فریای هیچ شتێکیان نەکەوتن کاتێک فەرمانی پەروەردگاری تۆ هات، هیچیان بۆ زیاد نەکردن جگە لە تیاچوون نەبێت.

(١٠٢) ئا بەو شێوەیەش تۆڵەسەندنی پەروەردگاری تۆ، کاتێک تۆڵە دەسێنێت لە خەڵکی شارو دێهاتەکان لەحاڵێکدا کە یاخی و ستەم پیشە بوون، بەڕاستی تۆڵەسەندنەکەی زۆر بەئێش و بەهێزو توندە.

(١٠٣) بێگومان لەو بەسەرهاتەدا نیشانە و پەندو ئامۆژگاری هەیە بۆ کەسێک لە سزای ڕۆژی دوایی بترسێت، ئەوە ڕۆژێکە خەڵکی بۆی کۆ دەکرێنەوە و ئەوە ڕۆژێکە خەڵکی هەموو ئامادە کراون و هەمووان لەبەرچاون دەبن تیایدا.

(١٠٤) ئێمە بەرپابوونی ئەو ڕۆژە دواناخەین مەگەر بۆ کاتێکی کەم و سنووردار نەبێت.

(١٠٥) ئەو ڕۆژەی کە ئەو ڕووداوە پێش دێت مەگەر خوای گەورە مۆڵەت بدات، ئەگینا کەس بۆی نیە قسە بکات، ئەوسا خەڵکەکە دەبنە دوو کۆمەڵ، کۆمەڵێک بەدبەخت و چارەڕەش، کۆمەڵێکیش بەختەوەرو کامەران.

(١٠٦) جا ئەوانەی بەدبەخت و چارە ڕەش بوون، ئەوە لەناو ئاگردان، هەناسە هەڵمژین و هەناسە دانەوەیان زۆر سەخت و دژوارە.

(١٠٧) بۆ هەمیشەش تیایدا دەمێننەوە تا ئاسمانەکان و زەوی هەبێت (کە ئەویش بۆ هەتاهەتایی دروست کراوە لە قیامەتدا)و مەگەر پەروەردگارت ویستی (گۆڕانکاری) هەبێت، بەڕاستی پەروەردگارت کارایە بۆ هەرشتێک بیەوێت.

(١٠٨) ئەوانەش کە کامەران و بەختیار کراون ئەوە لە بەهەشتدان، بۆ هەتاهەتایی تیایدا دەمێننەوە هەتا ئاسمانەکان و زەوی هەبێت (کە ئەویش بۆ هەتاهەتایی دروست کراوە لە قیامەتدا)و مەگەر پەروەردگارت ویستی (گۆڕانکاری) هەبێت، ئەمەش بەخششێکە هەرگیز کۆتایی نایەت.

فَلَا تَكُ فِي مِرْيَةٍ مِّمَّا يَعْبُدُ هَٰٓؤُلَآءِۚ مَا يَعْبُدُونَ إِلَّا كَمَا يَعْبُدُ ءَابَآؤُهُم مِّن قَبْلُۚ وَإِنَّا لَمُوَفُّوهُمْ نَصِيبَهُمْ غَيْرَ مَنقُوصٍ ﴿١٠٩﴾ وَلَقَدْ ءَاتَيْنَا مُوسَى ٱلْكِتَٰبَ فَٱخْتُلِفَ فِيهِۚ وَلَوْلَا كَلِمَةٌ سَبَقَتْ مِن رَّبِّكَ لَقُضِيَ بَيْنَهُمْۚ وَإِنَّهُمْ لَفِي شَكٍّ مِّنْهُ مُرِيبٍ ﴿١١٠﴾ وَإِنَّ كُلًّا لَّمَّا لَيُوَفِّيَنَّهُمْ رَبُّكَ أَعْمَٰلَهُمْۚ إِنَّهُۥ بِمَا يَعْمَلُونَ خَبِيرٌ ﴿١١١﴾ فَٱسْتَقِمْ كَمَآ أُمِرْتَ وَمَن تَابَ مَعَكَ وَلَا تَطْغَوْاْۚ إِنَّهُۥ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ ﴿١١٢﴾ وَلَا تَرْكَنُوٓاْ إِلَى ٱلَّذِينَ ظَلَمُواْ فَتَمَسَّكُمُ ٱلنَّارُ وَمَا لَكُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ مِنْ أَوْلِيَآءَ ثُمَّ لَا تُنصَرُونَ ﴿١١٣﴾ وَأَقِمِ ٱلصَّلَوٰةَ طَرَفَيِ ٱلنَّهَارِ وَزُلَفًا مِّنَ ٱلَّيْلِۚ إِنَّ ٱلْحَسَنَٰتِ يُذْهِبْنَ ٱلسَّيِّـَٔاتِۚ ذَٰلِكَ ذِكْرَىٰ لِلذَّٰكِرِينَ ﴿١١٤﴾ وَٱصْبِرْ فَإِنَّ ٱللَّهَ لَا يُضِيعُ أَجْرَ ٱلْمُحْسِنِينَ ﴿١١٥﴾ فَلَوْلَا كَانَ مِنَ ٱلْقُرُونِ مِن قَبْلِكُمْ أُوْلُواْ بَقِيَّةٍ يَنْهَوْنَ عَنِ ٱلْفَسَادِ فِي ٱلْأَرْضِ إِلَّا قَلِيلًا مِّمَّنْ أَنجَيْنَا مِنْهُمْۗ وَٱتَّبَعَ ٱلَّذِينَ ظَلَمُواْ مَآ أُتْرِفُواْ فِيهِ وَكَانُواْ مُجْرِمِينَ ﴿١١٦﴾ وَمَا كَانَ رَبُّكَ لِيُهْلِكَ ٱلْقُرَىٰ بِظُلْمٍ وَأَهْلُهَا مُصْلِحُونَ ﴿١١٧﴾

(١٠٩) جا هیچ لەگوماندا مەبە لە پووچەڵی و بێ سوودی ئەوەی ئەو بێ بڕوایانە دەیپەرستن و شوێنی کەوتوون، ئەوەی دەیپەرستن هیچ نیە جگە وێنەی ئەوە نەبێت کە باوو باپیریان پێشتر دەیانپەرست، بێگومان ئێمەش بەتێرو تەواوی بێ کەم وکووڕی پاداشتی کارو کردەوەیان دەدەینەوە.

(١١٠) سوێند بەخوا بەڕاستی ئێمە بەرنامەمان بە موسا بەخشی، کەچی جیاوازی تێدا دروست کرا، جا لەبەرئەوە نەبوایە کە خوای تۆ بڕیاریداوە (دادگاییان دوا بخات) هەر ئێستە دادگایی دەکردن و تۆڵەی لێ دەسەندن، کەچی بەڕاستی ئەو بێ بڕوایانە هەر لەگوماندان لێی و خەڵکیش تووشی گومان دەکەن.

(١١١) بەڕاستی هەموو ئەوانە پەروەردگارت پاداشتی کردەوەکانیان بەتەواوی دەداتەوە، بێگومان ئەو زاتە زۆر ئاگادارە بەوەی ئەوان ئەنجامی دەدەن و دەیکەن.

(١١٢) (ئەی محمد ﷺ) کەوابوو چۆن فەرمانت پێدراوە، هەروا بەڕاست و بەڕێکی فەرمانەکان بەجێ بهێنە، هەروەها ئەو کەسانەش لەگەڵ تۆدان و گەڕاونەتەوە بۆ لای خواو تەوبەیان کردووە، نەکەن لە سنووری فەرمانی خوا دەربچن، چونکە بەڕاستی ئەو زاتە زۆر بینایە بەو کردەوانەی کە دەیکەن.

(١١٣) نەکەن مەیلی دڵتان لەگەڵ ئەوانەدا بێت کە ستەمیان کردووە و لەخوا یاخی بوون، چونکە ئەو کاتە ئاگر دەتانسوتێنێت، کەسیش جگە لە خوا پشتیوانتان نابێت، لەوەودواییش یارمەتی نادرێن.

(١١٤) نوێژیش بەچاکی ئەنجام بدە لە هەردوو سەری ڕۆژەوە (کە نیوەڕۆ و عەسرە) و لە سێ کاتەکەی شەویشدا کە (مەغریب و عیشاو بەیانی) یە، نزیکن لە(ئەمسەرو ئەوسەری ڕۆژەوە، بەڕاستی کردەوە چاکەکان کردارە خراپەکان لادەبەن و گوناهەکان دەشۆنەوە، ئەوە ئامۆژگاری و بیرخەرەوەیە بۆ ئەوانەی یادی خوا دەکەن.

(١١٥) خۆشت بگرەو بە ئارامبە، چونکە بێگومان خوای گەورە پاداشتی چاکەخوازان بەزایە نادات.

(١١٦) جا ئەوە بۆ لەناو خەڵکی زەمانی پێش ئێوەدا کەسانی ژیرو دیندار نەبوو، کە بەرگریان لە خراپەو تاوان بکردایە لە زەویدا، مەگەر کەمێک نەبێت لەوانەی کە ڕزگارمان کردن لێیان، چونکە زۆربەیان لە سنووری فەرمانی خوا دەرچوون و شوێن ڕابواردنی دنیاو ئارەزوو کەوتن، ئیتر بەو کردەوە ناشرینەیان چوونە ڕیزی تاوانبارو خراپکارانەوە.

(١١٧) پەروەردگارت بە ستەم خەڵکی شارو دێهاتەکان لەناو نابات، لەکاتێکدا خەڵکەکەی چاکەخواز و چاکساز بن.

وَلَوْ شَاءَ رَبُّكَ لَجَعَلَ النَّاسَ أُمَّةً وَاحِدَةً وَلَا يَزَالُونَ مُخْتَلِفِينَ ﴿١١٨﴾ إِلَّا مَن رَّحِمَ رَبُّكَ وَلِذَٰلِكَ خَلَقَهُمْ وَتَمَّتْ كَلِمَةُ رَبِّكَ لَأَمْلَأَنَّ جَهَنَّمَ مِنَ الْجِنَّةِ وَالنَّاسِ أَجْمَعِينَ ﴿١١٩﴾ وَكُلًّا نَّقُصُّ عَلَيْكَ مِنْ أَنبَاءِ الرُّسُلِ مَا نُثَبِّتُ بِهِ فُؤَادَكَ وَجَاءَكَ فِي هَٰذِهِ الْحَقُّ وَمَوْعِظَةٌ وَذِكْرَىٰ لِلْمُؤْمِنِينَ ﴿١٢٠﴾ وَقُل لِّلَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ اعْمَلُوا عَلَىٰ مَكَانَتِكُمْ إِنَّا عَامِلُونَ ﴿١٢١﴾ وَانتَظِرُوا إِنَّا مُنتَظِرُونَ ﴿١٢٢﴾ وَلِلَّهِ غَيْبُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَإِلَيْهِ يُرْجَعُ الْأَمْرُ كُلُّهُ فَاعْبُدْهُ وَتَوَكَّلْ عَلَيْهِ وَمَا رَبُّكَ بِغَافِلٍ عَمَّا تَعْمَلُونَ ﴿١٢٣﴾



بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

الر تِلْكَ آيَاتُ الْكِتَابِ الْمُبِينِ ﴿١﴾ إِنَّا أَنزَلْنَاهُ قُرْآنًا عَرَبِيًّا لَّعَلَّكُمْ تَعْقِلُونَ ﴿٢﴾ نَحْنُ نَقُصُّ عَلَيْكَ أَحْسَنَ الْقَصَصِ بِمَا أَوْحَيْنَا إِلَيْكَ هَٰذَا الْقُرْآنَ وَإِن كُنتَ مِن قَبْلِهِ لَمِنَ الْغَافِلِينَ ﴿٣﴾ إِذْ قَالَ يُوسُفُ لِأَبِيهِ يَا أَبَتِ إِنِّي رَأَيْتُ أَحَدَ عَشَرَ كَوْكَبًا وَالشَّمْسَ وَالْقَمَرَ رَأَيْتُهُمْ لِي سَاجِدِينَ ﴿٤﴾

(١١٨) خۆ ئەگەر پەروەردگارت بیویستایە ئەوە هەموو خەڵکی دەکرد بەیەک تاقم و کۆمەڵ، (بەڵام) بەردەوامیش ئەو خەڵکە جیاوازن لەنێوانی یەکتردا لە ئایین و بەرنامە و بۆچووندا...

(١١٩) مەگەر ئەوەی بەزەیی پەروەردگارت گرتبێتیەوە، هەر بۆ ئەو مەبەستەش خوای گەورە دروستی کردوون، (واتە: بەشێوەیەک دروستی کردوون بتوانن ئازادی بیروباوەڕو بۆچوونیان هەبێت، ئینجا ڕێگەی ڕاستیان پێ بڵێت و بۆیان ڕوون بکاتەوە)و بڕیاری پەروەردگاری تۆ دەرچووە و تەواو بووە، کە: دۆزەخ پڕ دەکەم لەگرۆی پەری و خەڵکی (ئەوانەی خۆیان شیاوی ئاگر دەکەن).

(١٢٠) (ئەی محمد ﷺ) هەموو ئەوانەشت بۆ دەگێڕینەوە لە چیرۆک و هەواڵی پێغەمبەران، ئەوەی کە دڵی تۆی پێ دابمەزرێنین و دڵنیات بکەین، دڵنیاش بە کە لەم هەواڵانەدا حەق و ڕاستیت بۆ هات و بۆت ڕوونکرایەوە، هەروەها ئامۆژگاری و بیرخستەوەی باشی تێدابوو بۆ ئیمانداران.

(١٢١) بڵێ بەوانەش ئیمان ناهێنن و نیازیان وایە فەرمانبەرداری تۆ نەبن، ئێوە لە شوێنی خۆتاندا کاری خۆتان بکەن و بەڕاستی ئێمەش هەمیشە خەریک دەبین و کاری خۆمان دەکەین.

(١٢٢) بەردەوامیش چاوەڕێی دەرئەنجامی کاری هەردوو لا بکەن و ئێمەش بەڕاستی چاوەڕێین.

(١٢٣) هەر بۆ خوایە نهێنی و نادیارەکانی ئاسمانەکان و زەوی، هەموو کارو فەرمانیش هەر بۆ لای ئەو زاتە دەگەڕێتەوە، دەی کەوابوو ئەو بپەرستە و تەنها پشت بەو ببەستە، هەرگیز خوای پەروەردگارت بێ ئاگا نیە لەوەی کە ئێوە دەیکەن و ئەنجامی دەدەن.

سوورەتی (یوسف)

بەناوی خوای بەخشندە و میهرەبان

(١) سەرنجی سەرەتای سوورەتی (البقرة) بدە، ئەو ئایەتانەی لەم سوورەتەدا هاتووە چەند ئایەتێکی ئەو قورئانە ڕوون و ئاشکرایەیە.

(٢) بەڕاستی ئێمە ئەم ئایەتانەمان دابەزاندووە لە شێوەی قورئانێکی پاراودا بەزمانی عەرەبی بۆ ئەوەی ئێوە لێی تێبگەن و ژیریتان بخەنەکار.

(٣) ئێمە چاکترین و جوانترین چیرۆک و بەسەرهاتت بۆ دەگێڕینەوە (ئەی محمد ﷺ) بەهۆی ئەم قورئانەی کە نیگامان کرد بۆ لای تۆ، لەکاتێکدا بێگومان تۆ لە پێش ئەم قورئانەدا لەم بەسەرهاتە بێ ئاگا بوویت.

(٤) کاتێک یوسف بەباوکی وت: باوکی بەڕێزم بێگومان من لە خەومدا یازدە ئەستێرە و خۆرو مانگم بینی کڕنووشیان بۆ دەبردم.

قَالَ يَٰبُنَيَّ لَا تَقْصُصْ رُءْيَاكَ عَلَىٰٓ إِخْوَتِكَ فَيَكِيدُواْ لَكَ كَيْدًاۖ إِنَّ ٱلشَّيْطَٰنَ لِلْإِنسَٰنِ عَدُوٌّ مُّبِينٌ ﴿٥﴾ وَكَذَٰلِكَ يَجْتَبِيكَ رَبُّكَ وَيُعَلِّمُكَ مِن تَأْوِيلِ ٱلْأَحَادِيثِ وَيُتِمُّ نِعْمَتَهُۥ عَلَيْكَ وَعَلَىٰٓ ءَالِ يَعْقُوبَ كَمَآ أَتَمَّهَا عَلَىٰٓ أَبَوَيْكَ مِن قَبْلُ إِبْرَٰهِيمَ وَإِسْحَٰقَۚ إِنَّ رَبَّكَ عَلِيمٌ حَكِيمٌ ﴿٦﴾ ۞ لَّقَدْ كَانَ فِي يُوسُفَ وَإِخْوَتِهِۦٓ ءَايَٰتٌ لِّلسَّآئِلِينَ ﴿٧﴾ إِذْ قَالُواْ لَيُوسُفُ وَأَخُوهُ أَحَبُّ إِلَىٰٓ أَبِينَا مِنَّا وَنَحْنُ عُصْبَةٌ إِنَّ أَبَانَا لَفِي ضَلَٰلٍ مُّبِينٍ ﴿٨﴾ ٱقْتُلُواْ يُوسُفَ أَوِ ٱطْرَحُوهُ أَرْضًا يَخْلُ لَكُمْ وَجْهُ أَبِيكُمْ وَتَكُونُواْ مِنۢ بَعْدِهِۦ قَوْمًا صَٰلِحِينَ ﴿٩﴾ قَالَ قَآئِلٌ مِّنْهُمْ لَا تَقْتُلُواْ يُوسُفَ وَأَلْقُوهُ فِي غَيَٰبَتِ ٱلْجُبِّ يَلْتَقِطْهُ بَعْضُ ٱلسَّيَّارَةِ إِن كُنتُمْ فَٰعِلِينَ ﴿١٠﴾ قَالُواْ يَٰٓأَبَانَا مَا لَكَ لَا تَأْمَ۫نَّا عَلَىٰ يُوسُفَ وَإِنَّا لَهُۥ لَنَٰصِحُونَ ﴿١١﴾ أَرْسِلْهُ مَعَنَا غَدًا يَرْتَعْ وَيَلْعَبْ وَإِنَّا لَهُۥ لَحَٰفِظُونَ ﴿١٢﴾ قَالَ إِنِّي لَيَحْزُنُنِيٓ أَن تَذْهَبُواْ بِهِۦ وَأَخَافُ أَن يَأْكُلَهُ ٱلذِّئْبُ وَأَنتُمْ عَنْهُ غَٰفِلُونَ ﴿١٣﴾ قَالُواْ لَئِنْ أَكَلَهُ ٱلذِّئْبُ وَنَحْنُ عُصْبَةٌ إِنَّآ إِذًا لَّخَٰسِرُونَ ﴿١٤﴾



(٥) باوکی وتی: رۆڵە گیان خەوەکەت مەگێڕەوە بۆ براکانت، ئەوەکو بەهۆی ئەوەوە فێڵێکت لێبکەن و تووشی بەڵایەکت بکەن (چونکە ئەم خەوە داهاتوویەکی بڵند بۆ تۆ دەگەیەنێت، ئەوانیش حەسوودیت پێدەبەن) بەڕاستی شەیتانیش دوژمنێکی ئاشکرای نادەمیزادە...

(٦) بەو شێوەیەش خوای پەروەردگارت تۆ دیاری دەکات و هەڵتدەبژێریت (بۆ پێغەمبەرێتی)و هەندێک لێکدانەوەی خەوت فێر دەکات و نیعمەتەکانی خۆیت بەسەردا تەواو دەکات و هەروەها بەسەر نەوەکانی یەعقوبیشدا، هەروەک چۆن پێشتر نیعمەت و پلەوپایەی بڵندی بەخشی بەباپیرانت کە ئیبراهیم و ئیسحاقن، بەڕاستی پەروەردگارت زانا و دانایە.

(٧) سوێند بەخوا بێگومان لەم رووداوەی یوسف و براکانیدا نیشانەی زۆری (پێغەمبەرێتی محمدی) تێدایە بۆ کەسانێک پرسیار دەکەن لەو بارەیەوە (بەشوێن راستێتی تۆدا دەگەڕێن).

(٨) کاتێک براکانی یوسف وتیان: بەڕاستی یوسف و براکەی (بنیامین) لای باوکمان، لە ئێمە نازدارو خۆشەویستترن، لەکاتێکدا ئێمە کۆمەڵێکی بەهێزین، بەڕاستی باوکمان لە سەرلێشێواویەکی ئاشکرادایە.

(٩) (لەنێوان خۆیاندا هەندێکیان وتیان) یوسف بکوژن، یان فڕێی بدەنە شوێن و زەویەکی دوور، ئەو کاتە رووی باوکتان یەکلایی دەبێتەوە بۆ ئێوە و خۆشەویستیەکەی هەمووی بۆ ئێوە دەبێت، ئینجا دوای ئەمانی یوسف دەبنە پێرو نەوەیەکی چاک و رێک و پێک.

(١٠) یەکێک لە براکانی وتی: یوسف مەکوژن، بەڵکو بیخەنە ناو بیرێکی قووڵەوە، دوایی کاروان دێت و دەیدۆزنەوە و دەیبەن، ئەگەر بڕیار بێت هەر شتێکی لێ بکەن.

(١١) (دوای ئەو بڕیارە هاتنە لای باوکیان و) وتیان: ئەی باوکە ئەوە چیتە لە ئێمە دڵنیانیت لەبارەی یوسفەوە، بەڕاستی ئێمە زۆر دڵسۆزی ئەوین و زۆر خۆشمان دەوێت.

(١٢) بەیانی بینێرە لەگەڵمان با بای باڵی بدات گەمەو یاری بکات و بێگومان زۆر پارێزگاری لێ دەکەین و ناگامان لێی دەبێت.

(١٣) باوکیان وتی: من زۆر غەم و پەژارە دەمگرێت لەوەی کە ئێوە بیبەن، دەترسم گورگ بیخوات لەکاتێکدا کە ئێوە لێی بێ ئاگان (لەبەر یاری و گەمەی خۆتان).

(١٤) کوڕەکان وتیان: سوێند بەخوا ئەگەر بێت و یوسف گورگەکە بیخوات، لەکاتێکدا ئێمەش کۆمەڵێکی بەهێزین، بەڕاستی ئەو کاتە ئێمە خەسارەتمەندین (زەرەرمان لە خۆمانداوە و شەرمەزاری لای تۆ دەبین).

فَلَمَّا ذَهَبُوا بِهِۦ وَأَجْمَعُوٓا۟ أَن يَجْعَلُوهُ فِى غَيَٰبَتِ ٱلْجُبِّ ۚ وَأَوْحَيْنَآ إِلَيْهِ لَتُنَبِّئَنَّهُم بِأَمْرِهِمْ هَٰذَا وَهُمْ لَا يَشْعُرُونَ ﴿١٥﴾ وَجَآءُوٓ أَبَاهُمْ عِشَآءً يَبْكُونَ ﴿١٦﴾ قَالُوا۟ يَٰٓأَبَانَآ إِنَّا ذَهَبْنَا نَسْتَبِقُ وَتَرَكْنَا يُوسُفَ عِندَ مَتَٰعِنَا فَأَكَلَهُ ٱلذِّئْبُ ۖ وَمَآ أَنتَ بِمُؤْمِنٍ لَّنَا وَلَوْ كُنَّا صَٰدِقِينَ ﴿١٧﴾ وَجَآءُو عَلَىٰ قَمِيصِهِۦ بِدَمٍ كَذِبٍ ۚ قَالَ بَلْ سَوَّلَتْ لَكُمْ أَنفُسُكُمْ أَمْرًا ۖ فَصَبْرٌ جَمِيلٌ ۖ وَٱللَّهُ ٱلْمُسْتَعَانُ عَلَىٰ مَا تَصِفُونَ ﴿١٨﴾ وَجَآءَتْ سَيَّارَةٌ فَأَرْسَلُوا۟ وَارِدَهُمْ فَأَدْلَىٰ دَلْوَهُۥ ۖ قَالَ يَٰبُشْرَىٰ هَٰذَا غُلَٰمٌ ۚ وَأَسَرُّوهُ بِضَٰعَةً ۚ وَٱللَّهُ عَلِيمٌۢ بِمَا يَعْمَلُونَ ﴿١٩﴾ وَشَرَوْهُ بِثَمَنٍۭ بَخْسٍ دَرَٰهِمَ مَعْدُودَةٍ وَكَانُوا۟ فِيهِ مِنَ ٱلزَّٰهِدِينَ ﴿٢٠﴾ وَقَالَ ٱلَّذِى ٱشْتَرَىٰهُ مِن مِّصْرَ لِٱمْرَأَتِهِۦٓ أَكْرِمِى مَثْوَىٰهُ عَسَىٰٓ أَن يَنفَعَنَآ أَوْ نَتَّخِذَهُۥ وَلَدًا ۚ وَكَذَٰلِكَ مَكَّنَّا لِيُوسُفَ فِى ٱلْأَرْضِ وَلِنُعَلِّمَهُۥ مِن تَأْوِيلِ ٱلْأَحَادِيثِ ۚ وَٱللَّهُ غَالِبٌ عَلَىٰٓ أَمْرِهِۦ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٢١﴾ وَلَمَّا بَلَغَ أَشُدَّهُۥٓ ءَاتَيْنَٰهُ حُكْمًا وَعِلْمًا ۚ وَكَذَٰلِكَ نَجْزِى ٱلْمُحْسِنِينَ ﴿٢٢﴾

(١٥) جا کاتێک (سەرەنجام باوکیان رازی کردو) یوسفیان بردو هەموو هاتنە سەر ئەو بڕیارەی کە بیخەنە ناو تاریکای بیرەکەوە، لەو کاتەدا نیگامان بۆ نارد کە: هەواڵی ئەم بەسەرهاتە لەئایندەدا بە براکانت دەدەیت، کاتێک ئەوان ئاگایان لە خۆیان نابێت و لە بیریان چۆتەوە و هەستی پێناکەن.

(١٦) پاشان کە تاریک داهات هاتنە لای باوکیان، دەگریان...

(١٧) وتیان ئەی باوکی بەڕێزمان: بەڕاستی ئێمە رۆشتین پێشبڕکێمان دەکردو یوسفمان لای کەل و پەلەکەمان بەجێ هێشت، ئەوسا گورگەکە پەلاماری داو خواردی، بەڵام تۆ هەمیشە بڕوامان پێناکەیت ئەگەرچی ئێمە راستگۆش بین...

(١٨) براکانیشی هاتن بەهەندێ خوێنی ساختەوە کە بەسەر کراسەکەیەوە بوو (هێنایان بۆ باوکیان) ئەویش وتی: نەخێر وانیە، بەڵکو خۆتان بۆ خۆتان ئەم کارەتان سازداوە، جا چارم تەنها خۆگریی و ئارام گرتنە بەجوانترین شێوە، هەر خواش داوای کۆمەکی لێدەکرێت لەسەر ئەو باسەی ئێوە دەیکەن.

(١٩) ئەوسا کاروانێک هات و ئینجا ئاو هێنەرەکەیان نارد ئاو بهێنێت (ئەویش چووە سەربیرەکە)و سەتڵەکەی داهێشتە ناو بیرەکەوە، کاتێک هێنایە سەرەوە لەجیاتی ئاو یوسف هاتە دەرەوە، کاتێک کابرا بینی، وتی: خەڵکینە مژدە بێت ئەمە لاوێکە (ئەوسا هەر کەسێک بدۆزرایەتەوە دەکرا بەبەندەو دەفرۆشرا) یوسفیان شاردەوە و کردیانە کەرەسەی فرۆشتن، خوای گەورەش زاناو ئاگایە بەو کارو کردەوانەی کە دەیکەن (چاودێری یوسف دەکات و کارێکی گەورەی پێیەتی).

(٢٠) سەرئەنجام (بردیان و) فرۆشتیان لە بازاڕی کۆیلە فرۆشەکاندا لە میسر، بەنرخێکی هەرزان، چەند درهەمێکی کەم، لە فرۆشتنیدا هیچ گرنگییان پێنەداو کەم تەماع بوون (چونکە پشتیان پێوەی نەئێشا بوو).

(٢١) جا ئەو کەسەی یوسفی کڕی لە میسر، بەهاوسەرەکەی وت: رێز بگرە لە شوێن و جێگەی ئەم لاوە، بەئومێدی ئەوەی سوودمان پێبگەیەنێت، یان بیکەینە کوڕی خۆمان، ئا بەو شێوەیە یوسفمان جێگیرکرد لە زەویدا و پایەدارمان کرد، بۆ ئەوەش فێری بکەین چۆن خەو لێک بداتەوەو رووداوەکانی چوار دەوری وەک خۆی تێبگات، خوای گەورە زاڵە بەسەر کارو فەرمانەکانی خۆیدا، بەڵام زۆربەی خەڵکی بەمە نازانن.

(٢٢) کاتێکیش کە یوسف پێگەیشت و گەیشتە ئەوپەڕی توند و تۆڵی (لە رووی لاشەو ژیرییەوە)و ئێمەش پلەی فەرمانڕەوایی دانایی و زانیاری شارەزایی باشمان پێبەخشی، هەر بەو شێوەش پاداشتی چاکەکاران دەدەینەوە.

وَرَٰوَدَتۡهُ ٱلَّتِي هُوَ فِي بَيۡتِهَا عَن نَّفۡسِهِۦ وَغَلَّقَتِ ٱلۡأَبۡوَٰبَ وَقَالَتۡ هَيۡتَ لَكَۚ قَالَ مَعَاذَ ٱللَّهِۖ إِنَّهُۥ رَبِّيٓ أَحۡسَنَ مَثۡوَايَۖ إِنَّهُۥ لَا يُفۡلِحُ ٱلظَّٰلِمُونَ ﴿٢٣﴾ وَلَقَدۡ هَمَّتۡ بِهِۦۖ وَهَمَّ بِهَا لَوۡلَآ أَن رَّءَا بُرۡهَٰنَ رَبِّهِۦۚ كَذَٰلِكَ لِنَصۡرِفَ عَنۡهُ ٱلسُّوٓءَ وَٱلۡفَحۡشَآءَۚ إِنَّهُۥ مِنۡ عِبَادِنَا ٱلۡمُخۡلَصِينَ ﴿٢٤﴾ وَٱسۡتَبَقَا ٱلۡبَابَ وَقَدَّتۡ قَمِيصَهُۥ مِن دُبُرٖ وَأَلۡفَيَا سَيِّدَهَا لَدَا ٱلۡبَابِۚ قَالَتۡ مَا جَزَآءُ مَنۡ أَرَادَ بِأَهۡلِكَ سُوٓءًا إِلَّآ أَن يُسۡجَنَ أَوۡ عَذَابٌ أَلِيمٞ ﴿٢٥﴾ قَالَ هِيَ رَٰوَدَتۡنِي عَن نَّفۡسِيۚ وَشَهِدَ شَاهِدٞ مِّنۡ أَهۡلِهَآ إِن كَانَ قَمِيصُهُۥ قُدَّ مِن قُبُلٖ فَصَدَقَتۡ وَهُوَ مِنَ ٱلۡكَٰذِبِينَ ﴿٢٦﴾ وَإِن كَانَ قَمِيصُهُۥ قُدَّ مِن دُبُرٖ فَكَذَبَتۡ وَهُوَ مِنَ ٱلصَّٰدِقِينَ ﴿٢٧﴾ فَلَمَّا رَءَا قَمِيصَهُۥ قُدَّ مِن دُبُرٖ قَالَ إِنَّهُۥ مِن كَيۡدِكُنَّۖ إِنَّ كَيۡدَكُنَّ عَظِيمٞ ﴿٢٨﴾ يُوسُفُ أَعۡرِضۡ عَنۡ هَٰذَاۚ وَٱسۡتَغۡفِرِي لِذَنۢبِكِۖ إِنَّكِ كُنتِ مِنَ ٱلۡخَاطِـِٔينَ ﴿٢٩﴾ ۞ وَقَالَ نِسۡوَةٞ فِي ٱلۡمَدِينَةِ ٱمۡرَأَتُ ٱلۡعَزِيزِ تُرَٰوِدُ فَتَىٰهَا عَن نَّفۡسِهِۦۖ قَدۡ شَغَفَهَا حُبًّاۖ إِنَّا لَنَرَىٰهَا فِي ضَلَٰلٖ مُّبِينٖ ﴿٣٠﴾



(٢٣) جا ئەو ئافرەتەی کە یوسف لە ماڵیدا بوو هەوڵیدا یوسف لە خشتە ببات و دڵی رابکێشێت بۆ لای خۆی، هەموو دەرگاکانیشی داخست و وتی: وەرە پێشەوە و خۆت ئامادە بکە، یوسف وتی: پەنا دەگرم بە خوا کاری واناکەم، چونکە پەروەردگارم دەرووی لێ کردوومەتەوە، هەروەها مێردەکەشت چاک رەفتار بووە لەگەڵمدا (چۆن خیانەتی لێ دەکەم)و چونکە من دڵنیام ستەمکاران سەرفراز نابن.

(٢٤) سوێند بە خوا بێگومان ژنەکە پەلاماری یوسفیداو ویستی لێی بدات، یوسفیش نیازی لێدانی هەبوو ئەگەر بەڵگەی خوایی نەزانیایە (کە سەرەنجامی لێدانەکەی بەخراپ بەسەریدا دەشکێتەوە)و ئا بەو شێوەیەمان کرد (بۆ ئەوەی هەرچی گوناهو تاوان و خراپەیە لێی دوور دەخەینەوە)و بەڕاستی ئەو لە بەندە هەڵبژاردە و پاکەکانی ئێمەیە.

(٢٥) سەرەنجام هەردووکیان پێشبڕکێیان کرد بۆ دەرگاکە (یوسف بۆ کردنەوە و ئەویش بۆ داخستن) ژنەکە توانی دەستی لە کراسەکەی گیر بکات و لە پشتەوە دڕاندی، ئەوسا هەردووکیان لەبەردەمی دەرگاکەدا تووشی مێردەکەی هاتن، خێرا هاتە قسەو ویستی یوسف تاوانبار بکات بۆیە وتی: باشە ئاخۆ سزای ئەو کەسە چیە کە ویستبێتی خراپە لەگەڵ خێزانەکەتدا بکات، جگە لەوەی بەند بکرێت یان سزایەکی بەئێش بدرێت.

(٢٦) یوسف وتی: (نەخێر وانیە) ئەو ویستی لە خشتەم بەرێت، یەکێک لە خزمانی ژنەکە (کەگوێی لە بەسەرهاتەکە بوو، دیار بوو کە پیاوێکی زیرەک و دنیا دیدە بوو) شایەتیداو وتی: ئەگەر کراسەکەی یوسف لە پێشەوە دڕابێت ئەوە ژنەکە راست دەکات و ئەو کاتە یوسف یەکێکە لە درۆزنان.

(٢٧) خۆ ئەگەر کراسەکەی لە پشتەوە دڕابێت ئەوە ژنەکە درۆ دەکات و یوسف یەکێکە لە راستگۆیان.

(٢٨) کاتێک مێردەکەی بینی کراسەکەی یوسف لە پشتەوە دڕاوە، بەژنەکەی وت: بەڕاستی ئەمە پیلان و نەخشەی خۆتانە، بێگومان فێڵ و تەڵەکە و نەخشە و پیلانی ئێوە زۆر گەورەیە (لەم جۆرە شتانەدا).

(٢٩) ئینجا رووی کردە یوسف و وتی: ئەی یوسف، ئەم باسە فەرامۆش بکە و گوێی مەدەرێ، تۆش داوای لێخۆشبوون و لێبوردن بکە لە هەڵە و تاوانەکەت چونکە بەڕاستی تۆ لە گوناهباران و بەهەڵەچوانداییت.

(٣٠) پاشان ژنانێک لە ئافرەتانی ناو شار ئەم دەنگ و باسەیان بیست بۆیە وتیشیان: سەیرە! ژنەکەی عەزیزی میسر دەیەوێت بەنەرم و نیانی سەرنجی لاوەکەی خۆی رابکێشێت بۆلای خۆی، بەڕاستی ئەوینداریەکەی بۆی هەموو پەرەکانی دڵی داگیرکردووە، بێگومان ئێمە ئەو ژنە لەناو سەرگەردانیەکی ئاشکرادا دەبینین.

فَلَمَّا سَمِعَتۡ بِمَكۡرِهِنَّ أَرۡسَلَتۡ إِلَيۡهِنَّ وَأَعۡتَدَتۡ لَهُنَّ مُتَّكَـٔٗا وَءَاتَتۡ كُلَّ وَٰحِدَةٖ مِّنۡهُنَّ سِكِّينٗا وَقَالَتِ ٱخۡرُجۡ عَلَيۡهِنَّۖ فَلَمَّا رَأَيۡنَهُۥٓ أَكۡبَرۡنَهُۥ وَقَطَّعۡنَ أَيۡدِيَهُنَّ وَقُلۡنَ حَٰشَ لِلَّهِ مَا هَٰذَا بَشَرًا إِنۡ هَٰذَآ إِلَّا مَلَكٞ كَرِيمٞ ﴿٣١﴾ قَالَتۡ فَذَٰلِكُنَّ ٱلَّذِي لُمۡتُنَّنِي فِيهِۖ وَلَقَدۡ رَٰوَدتُّهُۥ عَن نَّفۡسِهِۦ فَٱسۡتَعۡصَمَۖ وَلَئِن لَّمۡ يَفۡعَلۡ مَآ ءَامُرُهُۥ لَيُسۡجَنَنَّ وَلَيَكُونٗا مِّنَ ٱلصَّٰغِرِينَ ﴿٣٢﴾ قَالَ رَبِّ ٱلسِّجۡنُ أَحَبُّ إِلَيَّ مِمَّا يَدۡعُونَنِيٓ إِلَيۡهِۖ وَإِلَّا تَصۡرِفۡ عَنِّي كَيۡدَهُنَّ أَصۡبُ إِلَيۡهِنَّ وَأَكُن مِّنَ ٱلۡجَٰهِلِينَ ﴿٣٣﴾ فَٱسۡتَجَابَ لَهُۥ رَبُّهُۥ فَصَرَفَ عَنۡهُ كَيۡدَهُنَّۚ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلۡعَلِيمُ ﴿٣٤﴾ ثُمَّ بَدَا لَهُم مِّنۢ بَعۡدِ مَا رَأَوُاْ ٱلۡأٓيَٰتِ لَيَسۡجُنُنَّهُۥ حَتَّىٰ حِينٖ ﴿٣٥﴾ وَدَخَلَ مَعَهُ ٱلسِّجۡنَ فَتَيَانِۖ قَالَ أَحَدُهُمَآ إِنِّيٓ أَرَىٰنِيٓ أَعۡصِرُ خَمۡرٗاۖ وَقَالَ ٱلۡأٓخَرُ إِنِّيٓ أَرَىٰنِيٓ أَحۡمِلُ فَوۡقَ رَأۡسِي خُبۡزٗا تَأۡكُلُ ٱلطَّيۡرُ مِنۡهُۖ نَبِّئۡنَا بِتَأۡوِيلِهِۦٓۖ إِنَّا نَرَىٰكَ مِنَ ٱلۡمُحۡسِنِينَ ﴿٣٦﴾ قَالَ لَا يَأۡتِيكُمَا طَعَامٞ تُرۡزَقَانِهِۦٓ إِلَّا نَبَّأۡتُكُمَا بِتَأۡوِيلِهِۦ قَبۡلَ أَن يَأۡتِيَكُمَاۚ ذَٰلِكُمَا مِمَّا عَلَّمَنِي رَبِّيٓۚ إِنِّي تَرَكۡتُ مِلَّةَ قَوۡمٖ لَّا يُؤۡمِنُونَ بِٱللَّهِ وَهُم بِٱلۡأٓخِرَةِ هُمۡ كَٰفِرُونَ ﴿٣٧﴾

(٣١) جا کاتێک ژنەکەی عەزیزی میسر توانج و پلارەکەی ئەوانی بیست، ئەویش ناردی بە شوێنیانداو جێگەیەکی خۆشی بۆ ئامادە کردن، چەقۆشی دایە دەستی هەریەکەیان، ئینجا فەرمانیدا بە یوسف و وتی: ئادەی وەرە دەرەوە بۆ لایان (با بتبینن)و جا کاتێک بینیيان بە گەورەو گرنگیان زانی و (الله اكبر) یان بۆ کردو بە بێئاگایی دەستی خۆیان بری وتیشیان: پاکی و بێگەردی و دووری لە هەموو ناتەواوییەک شایستەی خوایە کە ئەمەی دروست کردووە! ئەمە بەشەرنیە، تەنها فریشتەیەکی جوان و بەڕێزە و هیچی تر نیە.

(٣٢) ئینجا ژنەکە وتی: ئەوە ئەو کەسەیە کە ئێوە لۆمەو سەرزەنشتی منتان دەکرد لە بارەیەوە و سوێند بەخوا بێگومان من هەوڵمدا لە خشتەی بەرم، کەچی ئەو هەر خۆی گرت و پاک و خاوێنی وویست، سوێند بەخوا ئەگەر ئەوەی من فەرمانی پێدەدەم نەیکات، ئەوە بەڕاستی بەند دەکرێت و زەلیل دەبێت و بەکەم تەماشا دەکرێت.

(٣٣) یوسف کە ئەمەی بیست وتی: پەروەردگارا من زیندانم لەلا خۆشەویسترە لەوەی کە ئەوان بانگم دەکەن بۆی، خۆ ئەگەر لە فێڵ و تەڵەکەی ئەوانە رزگارم نەکەیت و لە پیلان و نەخشەکانیان دەربازم نەکەیت و لام نەدەیت، لەوانەیە منیش مەیلم بۆ دروست ببێت و ئارەزوویان بکەم و پاشان بچمە ریزی نەفام و گوناهبارانەوە.

(٣٤) جا پەروەردگاری بەهانایەوە چوو نزاکەی گیرا کردو لە تەڵەکە و فێڵی ژنان پاراستی و لایدا، چونکە بەڕاستی هەر ئەو زاتە بیسەری نزاکانە و زانایە (بە دڵ و دەروونەکان).

(٣٥) پاشان، لە دوای ئەوەی کە بەڵگەی زۆریان بینی لەسەر پاکی یوسف، بۆیان دەرکەوت و وایان بەچاک زانی تا ماوەیەک هەر بەندی بکەن.

(٣٦) ئەوسا دوو لاوی تریش بەتاوانی جیاجیا لەگەڵ یوسفدا خرانە بەندیخانەوە، (هەریەکەیان خەوێکی بینی بوو) یەکێکیان وتی: بێگومان من خۆمم دەبینی لە خەومدا ترێم دەگوشی و شەرابم لێ دروست دەکرد، ئەوی تریشیان وتی: بەڕاستی من خۆمم دەبینی لە خەومدا کە نانم بەسەر سەرمەوە هەڵدەگرت باڵندە لێی دەخوارد، ئاگادارمان بکە بەلێکدانەوەی ئەم خەونە، چونکە بەڕاستی ئێمە دەبینین تۆ لە چاکە خوازانیت و (شارەزای لە لێکدانەوەی خەودا)...

(٣٧) یوسف وتی: (من تەنها لێکدانەوەی خەون نازانم بەڵکو جگە لەوەش) هیچ خواردنێکتان بۆ نایەت کە دەرخواردتان بدرێت کە من نەزانم چیە و چۆنە پێش ئەوەی بگاتە لاتان (ئەمەش ئازایەتی خۆم نیە) بەڵکو ئەوە هەندێکە لەوەی پەروەردگارم فێری کردووم و بزانن بەڕاستی من بەرنامەی قەومێکم واز لێهێناوە کە باوەڕ بە خوا ناهێنن و هەمیشە بڕوایان بە قیامەتیش نیە.

وَٱتَّبَعۡتُ مِلَّةَ ءَابَآءِيٓ إِبۡرَٰهِيمَ وَإِسۡحَٰقَ وَيَعۡقُوبَۚ مَا كَانَ لَنَآ أَن نُّشۡرِكَ بِٱللَّهِ مِن شَيۡءٖۚ ذَٰلِكَ مِن فَضۡلِ ٱللَّهِ عَلَيۡنَا وَعَلَى ٱلنَّاسِ وَلَٰكِنَّ أَكۡثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَشۡكُرُونَ ﴿٣٨﴾ يَٰصَٰحِبَيِ ٱلسِّجۡنِ ءَأَرۡبَابٞ مُّتَفَرِّقُونَ خَيۡرٌ أَمِ ٱللَّهُ ٱلۡوَٰحِدُ ٱلۡقَهَّارُ ﴿٣٩﴾ مَا تَعۡبُدُونَ مِن دُونِهِۦٓ إِلَّآ أَسۡمَآءٗ سَمَّيۡتُمُوهَآ أَنتُمۡ وَءَابَآؤُكُم مَّآ أَنزَلَ ٱللَّهُ بِهَا مِن سُلۡطَٰنٍۚ إِنِ ٱلۡحُكۡمُ إِلَّا لِلَّهِ أَمَرَ أَلَّا تَعۡبُدُوٓاْ إِلَّآ إِيَّاهُۚ ذَٰلِكَ ٱلدِّينُ ٱلۡقَيِّمُ وَلَٰكِنَّ أَكۡثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعۡلَمُونَ ﴿٤٠﴾ يَٰصَٰحِبَيِ ٱلسِّجۡنِ أَمَّآ أَحَدُكُمَا فَيَسۡقِي رَبَّهُۥ خَمۡرٗاۖ وَأَمَّا ٱلۡأٓخَرُ فَيُصۡلَبُ فَتَأۡكُلُ ٱلطَّيۡرُ مِن رَّأۡسِهِۦۚ قُضِيَ ٱلۡأَمۡرُ ٱلَّذِي فِيهِ تَسۡتَفۡتِيَانِ ﴿٤١﴾ وَقَالَ لِلَّذِي ظَنَّ أَنَّهُۥ نَاجٖ مِّنۡهُمَا ٱذۡكُرۡنِي عِندَ رَبِّكَ فَأَنسَىٰهُ ٱلشَّيۡطَٰنُ ذِكۡرَ رَبِّهِۦ فَلَبِثَ فِي ٱلسِّجۡنِ بِضۡعَ سِنِينَ ﴿٤٢﴾ وَقَالَ ٱلۡمَلِكُ إِنِّيٓ أَرَىٰ سَبۡعَ بَقَرَٰتٖ سِمَانٖ يَأۡكُلُهُنَّ سَبۡعٌ عِجَافٞ وَسَبۡعَ سُنۢبُلَٰتٍ خُضۡرٖ وَأُخَرَ يَابِسَٰتٖۖ يَٰٓأَيُّهَا ٱلۡمَلَأُ أَفۡتُونِي فِي رُءۡيَٰيَ إِن كُنتُمۡ لِلرُّءۡيَا تَعۡبُرُونَ ﴿٤٣﴾

(٣٨) بەڵکو شوێنی ئایین و بەرنامەی باو و باپیرانم ئیبراهیم و ئیسحاق و یەعقوب کەوتووم ، هەرگیز ڕەوا نییە بۆ ئێمە هیچ جۆرە شتێک بکەینە هاوەڵ و شەریک بۆ خوا، ئەوەش لە فەزڵ و ڕێزی تایبەتی خواییە لەسەر ئێمە و لەسەر خەڵکیش، بەڵام بەداخەوە زۆربەی خەڵکی سوپاسگوزاری ناکەن.

(٣٩) (ئەوسا ڕووی تێکردن و وتی): ئەی هاوەڵانی زیندانیم؛ ئایا چەند خوایەکی هەمە جۆر و جیاواز (بپەرسترێن) چاکترن، یاخود خوایەکی تاک و تەنها و زاڵ بەسەر هەموو شتێکدا؟

(٤٠) جا هەرچی ئێوە دەیپەرستن جگە لە خوا، تەنها خۆتان و باو و باپیرانتان ناوتان لێناون (تەنها ناون و ناوەڕۆکیان نییە)، هەرگیز خوا بەوە ڕازی نییە و، هیچ بەڵگەیەکیشی ڕەوانە نەکردووە لەسەر پەسەند کردنیان، بەڕاستی حوکم و فەرمانڕەوایی جگە لە خوا شایستەی کەسی تر نییە، فەرمانیشی داوە جگە لە خۆی کەسی تر نەپەرستن، هەر ئەوەشە ئایین و بەرنامەی پەسەند و ڕاست و دروست و بەنرخ، بەڵام زۆربەی خەڵکی ئەم ڕاستیانە نازانن و لێی بێ ئاگان.

(٤١) ئەی هاوەڵانی زیندانیم، ئەوەتان لە خەونیدا ترێی دەگوشی ئەوە دەبێتە ساقی پاشا و ڕزگاری دەبێت و شەرابی پێشکەش دەکات، ئەوی تریش لە خاچ دەدرێت و باڵندە لەسەرو رووخساری دەخوات، ئیتر ئەمەش وەڵامی لێکدانەوەی خەونەکانتانە و هەر ئەوەش بڕیار دراوە.

(٤٢) ئەوسا یوسف بەو کەسەیانی وت : کەوای دەزانی ڕزگاری دەبێت و دەبێتە ساقی پاشا، باسم بکە لای پاشات (کە بەبێ تاوان من بەند کراوم)، بەڵام شەیتان بیری کابرای بردووە کە لە لای پاشای باسی بکات، ئیتر چەند ساڵێک (یوسف بەبێ تاوان) لە بەندینخانەدا مایەوە.

(٤٣) (شەوێک پاشا خەونێکی سەیری بینی و، بوو بە مەراقی و لە کۆبوونەوەیەکدا) وتی: بەڕاستی من لە خەومدا بینیم کە حەوت مانگای قەڵەو لەلایەن حەوت مانگای لەڕو لاوازەوە خوران، حەوت گوڵە گەنمی سەوز و جوان و حەوتی وشکیشم بینی، ئەی زاناو شارەزایان ئەم خەوەم بۆ لێک بدەنەوە ئەگەر خەون لێک دەدەنەوە ...

قَالُوٓاْ أَضۡغَٰثُ أَحۡلَٰمٖۖ وَمَا نَحۡنُ بِتَأۡوِيلِ ٱلۡأَحۡلَٰمِ بِعَٰلِمِينَ ﴿٤٤﴾ وَقَالَ ٱلَّذِي نَجَا مِنۡهُمَا وَٱدَّكَرَ بَعۡدَ أُمَّةٍ أَنَا۠ أُنَبِّئُكُم بِتَأۡوِيلِهِۦ فَأَرۡسِلُونِ ﴿٤٥﴾ يُوسُفُ أَيُّهَا ٱلصِّدِّيقُ أَفۡتِنَا فِي سَبۡعِ بَقَرَٰتٖ سِمَانٖ يَأۡكُلُهُنَّ سَبۡعٌ عِجَافٞ وَسَبۡعِ سُنۢبُلَٰتٍ خُضۡرٖ وَأُخَرَ يَابِسَٰتٖ لَّعَلِّيٓ أَرۡجِعُ إِلَى ٱلنَّاسِ لَعَلَّهُمۡ يَعۡلَمُونَ ﴿٤٦﴾ قَالَ تَزۡرَعُونَ سَبۡعَ سِنِينَ دَأَبٗا فَمَا حَصَدتُّمۡ فَذَرُوهُ فِي سُنۢبُلِهِۦٓ إِلَّا قَلِيلٗا مِّمَّا تَأۡكُلُونَ ﴿٤٧﴾ ثُمَّ يَأۡتِي مِنۢ بَعۡدِ ذَٰلِكَ سَبۡعٞ شِدَادٞ يَأۡكُلۡنَ مَا قَدَّمۡتُمۡ لَهُنَّ إِلَّا قَلِيلٗا مِّمَّا تُحۡصِنُونَ ﴿٤٨﴾ ثُمَّ يَأۡتِي مِنۢ بَعۡدِ ذَٰلِكَ عَامٞ فِيهِ يُغَاثُ ٱلنَّاسُ وَفِيهِ يَعۡصِرُونَ ﴿٤٩﴾ وَقَالَ ٱلۡمَلِكُ ٱئۡتُونِي بِهِۦۖ فَلَمَّا جَآءَهُ ٱلرَّسُولُ قَالَ ٱرۡجِعۡ إِلَىٰ رَبِّكَ فَسۡـَٔلۡهُ مَا بَالُ ٱلنِّسۡوَةِ ٱلَّٰتِي قَطَّعۡنَ أَيۡدِيَهُنَّۚ إِنَّ رَبِّي بِكَيۡدِهِنَّ عَلِيمٞ ﴿٥٠﴾ قَالَ مَا خَطۡبُكُنَّ إِذۡ رَٰوَدتُّنَّ يُوسُفَ عَن نَّفۡسِهِۦۚ قُلۡنَ حَٰشَ لِلَّهِ مَا عَلِمۡنَا عَلَيۡهِ مِن سُوٓءٖۚ قَالَتِ ٱمۡرَأَتُ ٱلۡعَزِيزِ ٱلۡـَٰٔنَ حَصۡحَصَ ٱلۡحَقُّ أَنَا۠ رَٰوَدتُّهُۥ عَن نَّفۡسِهِۦ وَإِنَّهُۥ لَمِنَ ٱلصَّٰدِقِينَ ﴿٥١﴾ ذَٰلِكَ لِيَعۡلَمَ أَنِّي لَمۡ أَخُنۡهُ بِٱلۡغَيۡبِ وَأَنَّ ٱللَّهَ لَا يَهۡدِي كَيۡدَ ٱلۡخَآئِنِينَ ﴿٥٢﴾

(٤٤) ئەوانیش وتیان: ئەم خەونە بێ سەرو بنە و هیچ نییە، ئێمە لە لێکدانەوەی خەونی بێ سەرو بن شارەزا نین .

(٤٥) ئینجا ئەوەیان کە رزگاری بوو بوو، بیری کەوتەوە دوای ئەو هەموو ماوەیە و وتی: داواکارم بمنێرن (بۆ لای یوسف) من هەواڵی (لێکدانەوەی ئەو خەونەتان) پێ رادەگەیەنم.

(٤٦) (ساقی چوو بۆ زیندانەکە بۆ دیداری یوسف وتی): یوسف، ئەی هاوەڵی راستگۆم، ئەم خەونەمان بۆ لێک بدەرەوە (لە خەونێکی پاشادا) حەوت مانگای قەڵەو لەلایەن حەوت مانگای لەرو لاوازەوە خوراون، هەروەها لەبارەی حەوت گوڵە گەنمی سەوزو جوان و حەوتی تری وشک بۆمان لێک بدەرەوە، بۆ ئەوەی بگەڕێمەوە بۆ لای خەڵکی تا وەڵام بزانن.

(٤٧) (یوسف) وتی: حەوت ساڵی بەردەوام کشتوکاڵ دەکەن و دانەوێڵە دەچێنن، ئەوەی کە دروێنەتان کردوو، لێتان زیادبوو بەگوڵەکەیەوە بیهێڵنەوە، مەگەر ئەو کەمەی کە دەیخۆن (دانەوێڵە بەگوڵەکەیەوە هەڵبگیرێت لە کرم و ئەسپێ و زایە بوون بەدوور دەبێت).

(٤٨) پاشان لە دوای ئەوە حەوت ساڵ گرانیی و سەختی پێش دێت، ئەوەی کە زەخیرەتان کردووە بۆ ئەو ساڵانە هەمووی دەخۆن، مەگەر کەمێکی نەبێت کە هەڵی دەگرن (بۆ تۆو).

(٤٩) لەوەودوا ساڵێکی باراناوی و پڕ بەرەکەت دێت کە خەڵکی بەرو بوومی زۆریان پێ دەبەخشرێت، میوە دەگوشن و شەربەتی لێ دروست دەکەن.

(٥٠) (ساقی گەڕایەوە بۆ لای پاشا و لێکدانەوەکەی یوسفی بۆ باس کرد، زۆری بەدڵ بوو، بۆیە پاشاش وتی): نادەی بچن بۆم بهێنن، جا کاتێک کە ڕەوانەکراوەکەی پاشا گەیشتە لای یوسف و (وتی : پاشا داوات دەکات، یوسف) وتی: بگەڕێرەوە بۆ لای پاشا و جا پێی بڵێ: هۆی چی بوو ئەو ئافرەتانە کاتی خۆی دەستی خۆیان بڕی و برینداریان کرد (ئایا من هیچ تاوانێکم لەوەدا هەیە ؟!) بەڕاستی هەر پەروەردگارم بە ئاگایە لە فێڵ و تەڵەکە و پیلانیان.

(٥١) (پاشا ئەو ئافرەتانەی هەموو کۆکردەوە) پێی وتن: ئەو کارە گرنگەتان چی بوو کاتێک کەوا ئێوە ویستتان یوسف لە خشتە بەرن (ئایا ئەو هیچ تاوانێکی هەبوو؟) هەموو وتیان: پەنا بەخوا (ئێمە بوختانی بۆ بکەین) ئێمە هیچ جۆرە هەڵەو ناشرینیەکمان لێ نەدیوە و نەزانیوە، (ژنەکەی عەزیزی میسر) وتی: ئا ئێستە ئیتر ڕاستی روون و ئاشکرابوو (دان بەڕاستیدا دەنێم)، خەتای من بوو دەمویست لە خشتەی بەرم و بەڕاستی یوسف یەکێکە لە ڕاستگۆیان.

(٥٢) (ئینجا یوسف) وتی : ئەوە ( بۆیە وام کرد ) تا (پاشا) چاک بزانێت و دڵنیا بێت بەڕاستی من لە نهێنیشدا خیانەتم لێ نەکردووە، بێگومانیش خوا فێڵ و تەڵەکەی خیانەتکاران بەئەنجام ناگەیەنێت.

(یاخود ژنەکە وتی): تا یوسف دڵنیا بێت کە لە نهێنداو (ئێستە کە ئەو لێرە نییە) خیانەتی لێ ناکەم و بوختانی بۆ هەڵنابەستم ، چونکە (بۆم دەرکەوتووە) کە خوا فێڵ و تەڵەکەی خیانەتکاران بەئەنجام ناگەیەنێت.



﴿ وَمَآ أُبَرِّئُ نَفْسِيٓۚ إِنَّ ٱلنَّفْسَ لَأَمَّارَةُۢ بِٱلسُّوٓءِ إِلَّا مَا رَحِمَ رَبِّيٓۚ إِنَّ رَبِّي غَفُورٞ رَّحِيمٞ ٥٣ وَقَالَ ٱلۡمَلِكُ ٱئۡتُونِي بِهِۦٓ أَسۡتَخۡلِصۡهُ لِنَفۡسِيۖ فَلَمَّا كَلَّمَهُۥ قَالَ إِنَّكَ ٱلۡيَوۡمَ لَدَيۡنَا مَكِينٌ أَمِينٞ ٥٤ قَالَ ٱجۡعَلۡنِي عَلَىٰ خَزَآئِنِ ٱلۡأَرۡضِۖ إِنِّي حَفِيظٌ عَلِيمٞ ٥٥ وَكَذَٰلِكَ مَكَّنَّا لِيُوسُفَ فِي ٱلۡأَرۡضِ يَتَبَوَّأُ مِنۡهَا حَيۡثُ يَشَآءُۚ نُصِيبُ بِرَحۡمَتِنَا مَن نَّشَآءُۖ وَلَا نُضِيعُ أَجۡرَ ٱلۡمُحۡسِنِينَ ٥٦ وَلَأَجۡرُ ٱلۡأٓخِرَةِ خَيۡرٞ لِّلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَكَانُواْ يَتَّقُونَ ٥٧ وَجَآءَ إِخۡوَةُ يُوسُفَ فَدَخَلُواْ عَلَيۡهِ فَعَرَفَهُمۡ وَهُمۡ لَهُۥ مُنكِرُونَ ٥٨ وَلَمَّا جَهَّزَهُم بِجَهَازِهِمۡ قَالَ ٱئۡتُونِي بِأَخٖ لَّكُم مِّنۡ أَبِيكُمۡۚ أَلَا تَرَوۡنَ أَنِّيٓ أُوفِي ٱلۡكَيۡلَ وَأَنَا۠ خَيۡرُ ٱلۡمُنزِلِينَ ٥٩ فَإِن لَّمۡ تَأۡتُونِي بِهِۦ فَلَا كَيۡلَ لَكُمۡ عِندِي وَلَا تَقۡرَبُونِ ٦٠ قَالُواْ سَنُرَٰوِدُ عَنۡهُ أَبَاهُ وَإِنَّا لَفَٰعِلُونَ ٦١ وَقَالَ لِفِتۡيَٰنِهِ ٱجۡعَلُواْ بِضَٰعَتَهُمۡ فِي رِحَالِهِمۡ لَعَلَّهُمۡ يَعۡرِفُونَهَآ إِذَا ٱنقَلَبُوٓاْ إِلَىٰٓ أَهۡلِهِمۡ لَعَلَّهُمۡ يَرۡجِعُونَ ٦٢ فَلَمَّا رَجَعُوٓاْ إِلَىٰٓ أَبِيهِمۡ قَالُواْ يَٰٓأَبَانَا مُنِعَ مِنَّا ٱلۡكَيۡلُ فَأَرۡسِلۡ مَعَنَآ أَخَانَا نَكۡتَلۡ وَإِنَّا لَهُۥ لَحَٰفِظُونَ ٦٣

(٥٣) (دەشێت یوسف یان ژنەکەی عەزیزی میسر وتبێتی) منیش نەفسی خۆم بەری ناکەم، چونکە بەراستی نەفس (ئەگەر بە نووری خواناسی ناوەدان نەبێت) زۆر فەرماندەرە بەگوناهو هەڵەو تاوان، مەگەر نەفسێک کە پەروەردگارم میهرەبانی پێ کردبێت، بەراستی پەروەردگارم لێ خۆشبوو میهرەبانە.

(٥٤) (ئەوسا پاشا کە راستیەکانی بە تەواویی بۆ دەرکەوت ئەوەندەی تر یوسفی لا بەرێزو بەنرخ بوو بۆیە) فەرمانیداو وتی: ئادەی بچن بۆم بهێنن، ئەو (لاوە پاکە ژیرە زانایە) تایبەتی دەکەم بۆخۆم ولە نزیکانی من بێت، جا کاتێک (هێنایان) و پاشا قسەی لەگەڵ کرد، وتی: ئەمرۆ ئیتر بەراستی تۆ لای ئێمە خاوەنی پلەو جێگەی متمانە و باوەڕی.

(٥٥) یوسف وتی: پێم باشە بمکەیت بەلێپرسراو بەسەرگەنجینەکان و سامانی سەر زەوی ئەم وڵاتە، (میسر) بەراستی من پارێزەرێکی زانام (لە خۆم رادەبینم کە شت بپارێزم و زاناشم کە چۆن دەیپارێزم).

(٥٦) (خوا دەفەرموێت) تا بەو شێوەیە دەسەڵاتمان دا بە یوسف و جێگیر و پایەدارمان کرد لە خاکی میسردا، هەر پلەو پایەیەکی دەویست لەو وڵاتەدا دەستی دەکەوت و بۆی ساز دەبوو، هەر کەسێک، هەر دەستەیەک بمانەوێت بەهرەوەری دەکەین لە رەحمەت و بەخشش‌ەکانمان و پاداشتی چاکەکاران بەزایە نادەین.

(٥٧) بێگومان پاداشتی ئەو جیهان (لە بەهەشتی بەریندا) چاکترە بۆ ئەوانەی کە ئیمان و باوەڕیان هێناوە و خۆیان دەپاراست.

(٥٨) (ساڵانی گرانی هاتە پێشەوە) براکانی یوسف (هاتن بۆ میسر) جا چوونە دیوانی، ئەو ئەوانی ناسیەوە، بەڵام ئەوان ئەمیان نەناسیەوە (چونکە پۆشاکی وەزیری لە بەردا بوو، هەرگیز شتی وایان چاوەڕوان نەدەکرد).

(٥٩) (ئەویش رێزی گرتن و دواندنی و پێی دەرخستن کە برایەکی باوکییان هەیە و نەیانهێناوە لەبەرئەوە) لەکاتێکدا رێکی خستن و بارگە و بنەی بۆ پێچانەوە وتی: (من حەز دەکەم) برایەکی باوکیتان هەیە بۆم بهێنن، ئایا نابینن بەراستی من چۆن کێشانە و پێوانەم تێرو تەواوە و، چۆن رێز لە میوان دەگرم (یارمەتی هەژاران دەدەم).

(٦٠) خۆ ئەگەر ئەو برایەتانم بۆ نەهێنن، ئەوە ئیتر هیچ موعامەلە و کێشانە و پێوانەی ئێوە لای من نیە و نزیکم مەکەونەوە.

(٦١) (لە وەڵامیدا) وتیان: ئێمە بەهەموو شێوەیەک هەوڵ دەدەین و نەخشە دەکێشین بۆ ئەو مەبەستە (هەتا) باوکی رازی بکەین (ئەم جارە بیهێنین)، بێگومان ئێمە ئەو کارە دەکەین.

(٦٢) (لە فرسەتێکدا) یوسف بەلاوەکانی بەردەستی وت: هەرچی شتومەک و کەلو پەلێکیان هێناوە بیخەنەوە ناو بارەکانیان، بۆ ئەوەی بیناسنەوە کاتێک دەگەڕێنەوە بۆ لای کەس و کاریان بۆ ئەوەی (ببێتە هاندەرێک و) بێنەوە.

(٦٣) جا کاتێک گەڕانەوە بۆ لای باوکیان وتیان: باوکی بەڕێزمان، (کێشان و) پێوانمان لێ قەدەغە کراوە (تا بنیامینی برامان لەگەڵ خۆماندا نەبەین)، کەواتە براکەمان لەگەڵ بنێرە تاپێوانە بکەین (بەدەست بەتاڵی نەگەڕێینەوە)، بەڵێن بێت پارێزەرین بۆی.

قَالَ هَلْ ءَامَنُكُمْ عَلَيْهِ إِلَّا كَمَآ أَمِنتُكُمْ عَلَىٰٓ أَخِيهِ مِن قَبْلُ فَٱللَّهُ خَيْرٌ حَـٰفِظًا وَهُوَ أَرْحَمُ ٱلرَّٰحِمِينَ ﴿٦٤﴾ وَلَمَّا فَتَحُوا۟ مَتَـٰعَهُمْ وَجَدُوا۟ بِضَـٰعَتَهُمْ رُدَّتْ إِلَيْهِمْ قَالُوا۟ يَـٰٓأَبَانَا مَا نَبْغِى هَـٰذِهِۦ بِضَـٰعَتُنَا رُدَّتْ إِلَيْنَا وَنَمِيرُ أَهْلَنَا وَنَحْفَظُ أَخَانَا وَنَزْدَادُ كَيْلَ بَعِيرٍ ذَٰلِكَ كَيْلٌ يَسِيرٌ ﴿٦٥﴾ قَالَ لَنْ أُرْسِلَهُۥ مَعَكُمْ حَتَّىٰ تُؤْتُونِ مَوْثِقًا مِّنَ ٱللَّهِ لَتَأْتُنَّنِى بِهِۦٓ إِلَّآ أَن يُحَاطَ بِكُمْ فَلَمَّآ ءَاتَوْهُ مَوْثِقَهُمْ قَالَ ٱللَّهُ عَلَىٰ مَا نَقُولُ وَكِيلٌ ﴿٦٦﴾ وَقَالَ يَـٰبَنِىَّ لَا تَدْخُلُوا۟ مِنۢ بَابٍ وَٰحِدٍ وَٱدْخُلُوا۟ مِنْ أَبْوَٰبٍ مُّتَفَرِّقَةٍ وَمَآ أُغْنِى عَنكُم مِّنَ ٱللَّهِ مِن شَىْءٍ إِنِ ٱلْحُكْمُ إِلَّا لِلَّهِ عَلَيْهِ تَوَكَّلْتُ وَعَلَيْهِ فَلْيَتَوَكَّلِ ٱلْمُتَوَكِّلُونَ ﴿٦٧﴾ وَلَمَّا دَخَلُوا۟ مِنْ حَيْثُ أَمَرَهُمْ أَبُوهُم مَّا كَانَ يُغْنِى عَنْهُم مِّنَ ٱللَّهِ مِن شَىْءٍ إِلَّا حَاجَةً فِى نَفْسِ يَعْقُوبَ قَضَىٰهَا وَإِنَّهُۥ لَذُو عِلْمٍ لِّمَا عَلَّمْنَـٰهُ وَلَـٰكِنَّ أَكْثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٦٨﴾ وَلَمَّا دَخَلُوا۟ عَلَىٰ يُوسُفَ ءَاوَىٰٓ إِلَيْهِ أَخَاهُ قَالَ إِنِّىٓ أَنَا۠ أَخُوكَ فَلَا تَبْتَئِسْ بِمَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴿٦٩﴾

(٦٤) یه‌عقوبی باوکیان وتی: (ئه‌مه داخوازیه‌کی سه‌یره) ئایا هه‌روا متمانه‌تان پێ بکه‌م له‌سه‌ری مه‌گه‌ر هه‌روه‌ک پێشتر متمانه‌م پێکردن له‌سه‌ر یوسفی برای؟! (سه‌ره‌نجام رازیان کرد و، ئه‌ویش وتی) که‌واته خوا چاکترین پارێزه‌ره‌و هه‌ر ئه‌و میهره‌بانترینی میهره‌بانانه.

(٦٥) کاتێکیش که‌لوپه‌ل و بارگه و بنه‌کانیان کرده‌وه بینییان هه‌رچی شتومه‌کیانه هه‌ر ئه‌وه خراوه‌ته‌وه باره‌کانیان و گه‌ڕێنراوه‌ته‌وه بۆیان، (ئینجا باوکیان بانگ کردو) وتیان: باوکی به‌ڕێزمان ئێمه چی بکه‌ین، چی بڵێین (له به‌رامبه‌ر ئه‌و پاشا به‌ڕێزه‌وه) ئه‌وه‌ته هه‌رچی کەل و په‌لمان هه‌یه گه‌ڕێنراوه‌ته‌وه بۆمان و(تۆ ئه‌گه‌ر مۆڵه‌تی بنیامین بده‌ی) رزق و رۆزیی زۆر ده‌هێنین بۆ که‌س و کارمان، براکه‌شمان ده‌پارێزین و باری وشترێکیش زیاتر ده‌هێنین، ئه‌و باره‌ش شتێکی ئاسانه.

(٦٦) یه‌عقوب وتی: هه‌رگیز له‌گه‌ڵتاندا نایینێرم هه‌تا په‌یمانێکی خواییم پێ نه‌ده‌ن (سوێند نه‌خۆن) که بێگومان بیهێننه‌وه بۆ لام، مه‌گه‌ر ده‌وره بدرێن و هیچ ده‌سه‌لاتتان نه‌مێنێت، جا کاتێک په‌یمانه‌که‌یان دایه و سوێندیان بۆ خوارد، یه‌عقوب وتی: خوا خۆی ئاگادارو چاودێره به‌و په‌یمانه‌ی که بڕیارمان له‌سه‌رداوه.

(٦٧) هه‌روه‌ها وتی: کوڕه‌کانم، هه‌مووتان له یه‌ک ده‌روازه‌وه مه‌چنه ژووره‌وه و له چه‌ند ده‌روازه‌یه‌کی جیا جیاوه بچنه ژووره‌وه (خۆتان بکه‌ن به شاردا)، دڵنیاش بن که من ناتوانم هیچ شتێک له‌و به‌لاو پێشهاتانه‌ی که بڕیاری خوای له‌سه‌ره بگێڕمه‌وه له ئێوه، هیچ فه‌رمان و بڕیارێک بۆ که‌س نی‌یه، ته‌نها بۆ خوا نه‌بێت، پشتم هه‌ر به‌و به‌ستووه‌و پشت و په‌نام هه‌ر ئه‌وه، جا ده‌با ئه‌وانه‌ی که پاڵپشت و پشتیوانیان ده‌وێت هه‌رپشت به‌و ببه‌ستن.

(٦٨) کاتێک چوونه ناوه‌وه به‌و شێوه‌یه‌ی که باوکیان فه‌رمانی پێدابوون، جا وه‌نه‌بێت باوکیان توانیبێتی فریایان بکه‌وێت و له هیچ پێشهاتێک رزگاریان بکات که بڕیارداده‌ی خوای له‌سه‌ره، (ئه‌و رێنموویی‌یه) ته‌نها پێداویستیه‌کی ده‌روونی یه‌عقوب خۆی بوو، رایگه‌یاند، به‌ڕاستی یه‌عقوب خاوه‌نی زانستێک بوو، چونکه ئێمه فێرمان کردبوو و به‌ڵام زۆربه‌ی خه‌ڵکی راستیه‌کان نازانن.

(٦٩) کاتێکیش که کوڕه‌کان چوونه ژووره‌وه بۆ لای یوسف، بنیامینی برای نزیک کرده‌وه له خۆی و(له فرسه‌تێکدا) وتی: به‌ڕاستی من یوسفی براتم، جا خه‌فه‌ت مه‌خۆو خه‌مت نه‌بێت به‌و هه‌ڵس و که‌وته‌ی ئه‌وان ده‌یانکرد (چونکه من نه‌خشه‌م کێشاوه تۆ لێره بهێڵمه‌وه، تا له لای خۆم ژیان به‌سه‌ر به‌ریت).

فَلَمَّا جَهَّزَهُم بِجَهَازِهِمْ جَعَلَ ٱلسِّقَايَةَ فِي رَحْلِ أَخِيهِ ثُمَّ أَذَّنَ مُؤَذِّنٌ أَيَّتُهَا ٱلْعِيرُ إِنَّكُمْ لَسَٰرِقُونَ ﴿٧٠﴾ قَالُوا۟ وَأَقْبَلُوا۟ عَلَيْهِم مَّاذَا تَفْقِدُونَ ﴿٧١﴾ قَالُوا۟ نَفْقِدُ صُوَاعَ ٱلْمَلِكِ وَلِمَن جَآءَ بِهِۦ حِمْلُ بَعِيرٍ وَأَنَا۠ بِهِۦ زَعِيمٌ ﴿٧٢﴾ قَالُوا۟ تَٱللَّهِ لَقَدْ عَلِمْتُم مَّا جِئْنَا لِنُفْسِدَ فِي ٱلْأَرْضِ وَمَا كُنَّا سَٰرِقِينَ ﴿٧٣﴾ قَالُوا۟ فَمَا جَزَٰٓؤُهُۥٓ إِن كُنتُمْ كَٰذِبِينَ ﴿٧٤﴾ قَالُوا۟ جَزَٰٓؤُهُۥ مَن وُجِدَ فِي رَحْلِهِۦ فَهُوَ جَزَٰٓؤُهُۥ ۚ كَذَٰلِكَ نَجْزِي ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٧٥﴾ فَبَدَأَ بِأَوْعِيَتِهِمْ قَبْلَ وِعَآءِ أَخِيهِ ثُمَّ ٱسْتَخْرَجَهَا مِن وِعَآءِ أَخِيهِ ۚ كَذَٰلِكَ كِدْنَا لِيُوسُفَ ۖ مَا كَانَ لِيَأْخُذَ أَخَاهُ فِي دِينِ ٱلْمَلِكِ إِلَّآ أَن يَشَآءَ ٱللَّهُ ۚ نَرْفَعُ دَرَجَٰتٍ مَّن نَّشَآءُ ۗ وَفَوْقَ كُلِّ ذِي عِلْمٍ عَلِيمٌ ﴿٧٦﴾ ۞ قَالُوٓا۟ إِن يَسْرِقْ فَقَدْ سَرَقَ أَخٌ لَّهُۥ مِن قَبْلُ ۚ فَأَسَرَّهَا يُوسُفُ فِي نَفْسِهِۦ وَلَمْ يُبْدِهَا لَهُمْ ۚ قَالَ أَنتُمْ شَرٌّ مَّكَانًا ۖ وَٱللَّهُ أَعْلَمُ بِمَا تَصِفُونَ ﴿٧٧﴾ قَالُوا۟ يَٰٓأَيُّهَا ٱلْعَزِيزُ إِنَّ لَهُۥٓ أَبًا شَيْخًا كَبِيرًا فَخُذْ أَحَدَنَا مَكَانَهُۥٓ ۖ إِنَّا نَرَىٰكَ مِنَ ٱلْمُحْسِنِينَ ﴿٧٨﴾



(٧٠) جا کاتێك یوسف بارگـە و بنـەی بـۆ پێچانـەوە و سـازی کـردن (خـۆراك و دانەوێڵـەی پێویستی) پێبەخشـین جامولکـەی کێشـان و پێوانی خستە ناو باری بنیامینی برایەوە، پاشـان جارچیەك بەدەنگی بەرز وتـی: ئـەی کاروانچیـان ئێوە بەڕاستی دزن؟!

(٧١) ئەوانیش بەپەلە گەڕانـەوە و هـاتن بـەرەو ڕوویـان و وتیـان: چی دیـار نیە؟ چیتـان لێ ون بووە؟

(٧٢) پاسـەوانەکان وتیـان: جامولکـە و دەفـری پاشـامان لێ ون بـووەو بـۆی دەگـەڕێین، هـەر کەسێك هێنـای بـاری وشـترێکی بـۆ هەیـە (لێپرسراوەکەیان وتی): من دەبمـە زامنـی ئـەو بەڵێنە.

(٧٣) کورەکان وتیان: سوێند بە خوا، بـەڕاستی ئێوە چاك دەزانن کە ئێمـە بـۆ ئـەوە نـەهاتووین فەسادو خراپە لە زەویدا بکەین و ئێمە دزنین.

(٧٤) پاسـەوانەکان وتیـان: ئەگـەر (دەرکـەوت) ئێوە درۆزن بوون، کەوابوو پاداشتی ئەودزە چیە؟

(٧٥) کوڕەکان وتیان: پاداشتەکەی ئەو کەسـەی کە دەفرە دزراوەکە لـە بارەکـەیدا دەدۆزرێتـەوە، ئەوە پاداشتەکەیەتی (کە بریتیە لەوەی بارمتە بێـت لای خـاوەنی شتە دزراوەکـە)، ئێمـە ئـا بـەو شێوەیە تۆڵـە لـە ستەمکاران دەسێنین.

(٧٦) ئینجا یوسف خۆی دەستی کرد بەگەڕان بەبارەکاندا پێش ئەوەی باری بنیامینی برای بپشـکنێت، لـەوەودوا لـە باری براکەیدا دەری هێنا، ئا بەو شێوەیە یوسفمان فێری ئەنخشەی گلدانەوەی براکەی کرد، نەدەبوو بە دەسـتوری پاشا براکەی گل بداتەوە، مەگەر ویستی خوای گەورەی لەسەر بێت، بەو شێوەیە چـەندەها جـار پلـەو پایـەی هەرکـەس کـە بمانەوێت بەرزو بڵند دەکەینەوە و لە سەروو هەموو خاوەن زانست و زانیاریەکەوە زانا و شارەزاتر هەیە.

(٧٧) براکانی وتیان: ئەگەر ئەو دزی بکات، ئەوە براکەشی بێگومان دزی کردووە لەمەوپێش، ئینجا یوسف ئەو قسە ناڕەواو تۆمەتە ناقۆڵایەی لە دڵی خۆیدا هێشتەوە و نەیخستە ڕوو بۆ ئەوان، وتی: ئێوە لەکەسانێکی بـاش نـاچن، جا خوا خۆی لە هەموو کەس زاناترە بەوەی کە دەیڵێن و باسی دەکەن.

(٧٨) براکانی وتیان: جەنابی پاشا، بەڕاستی ئەم کوڕە باوکێکی پیری بەساڵاچووی هەیە، کەواتە یەکێك لە ئێمە لـە جیاتی ئەو گل بدەرەوە، چونکە بێگومان ئێمە، تۆ بە پیاو چاك و چاکەخواز دەزانین.

قَالَ مَعَاذَ ٱللَّهِ أَن نَّأْخُذَ إِلَّا مَن وَجَدْنَا مَتَٰعَنَا عِندَهُۥٓ إِنَّآ إِذًا لَّظَٰلِمُونَ ﴿٧٩﴾ فَلَمَّا ٱسْتَيْـَٔسُوا۟ مِنْهُ خَلَصُوا۟ نَجِيًّا ۖ قَالَ كَبِيرُهُمْ أَلَمْ تَعْلَمُوٓا۟ أَنَّ أَبَاكُمْ قَدْ أَخَذَ عَلَيْكُم مَّوْثِقًا مِّنَ ٱللَّهِ وَمِن قَبْلُ مَا فَرَّطتُمْ فِى يُوسُفَ ۖ فَلَنْ أَبْرَحَ ٱلْأَرْضَ حَتَّىٰ يَأْذَنَ لِىٓ أَبِىٓ أَوْ يَحْكُمَ ٱللَّهُ لِى ۖ وَهُوَ خَيْرُ ٱلْحَٰكِمِينَ ﴿٨٠﴾ ٱرْجِعُوٓا۟ إِلَىٰٓ أَبِيكُمْ فَقُولُوا۟ يَٰٓأَبَانَآ إِنَّ ٱبْنَكَ سَرَقَ وَمَا شَهِدْنَآ إِلَّا بِمَا عَلِمْنَا وَمَا كُنَّا لِلْغَيْبِ حَٰفِظِينَ ﴿٨١﴾ وَسْـَٔلِ ٱلْقَرْيَةَ ٱلَّتِى كُنَّا فِيهَا وَٱلْعِيرَ ٱلَّتِىٓ أَقْبَلْنَا فِيهَا ۖ وَإِنَّا لَصَٰدِقُونَ ﴿٨٢﴾ قَالَ بَلْ سَوَّلَتْ لَكُمْ أَنفُسُكُمْ أَمْرًا ۖ فَصَبْرٌ جَمِيلٌ ۖ عَسَى ٱللَّهُ أَن يَأْتِيَنِى بِهِمْ جَمِيعًا ۚ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلْعَلِيمُ ٱلْحَكِيمُ ﴿٨٣﴾ وَتَوَلَّىٰ عَنْهُمْ وَقَالَ يَٰٓأَسَفَىٰ عَلَىٰ يُوسُفَ وَٱبْيَضَّتْ عَيْنَاهُ مِنَ ٱلْحُزْنِ فَهُوَ كَظِيمٌ ﴿٨٤﴾ قَالُوا۟ تَٱللَّهِ تَفْتَؤُا۟ تَذْكُرُ يُوسُفَ حَتَّىٰ تَكُونَ حَرَضًا أَوْ تَكُونَ مِنَ ٱلْهَٰلِكِينَ ﴿٨٥﴾ قَالَ إِنَّمَآ أَشْكُوا۟ بَثِّى وَحُزْنِىٓ إِلَى ٱللَّهِ وَأَعْلَمُ مِنَ ٱللَّهِ مَا لَا تَعْلَمُونَ ﴿٨٦﴾

(٧٩) یوسف وتی: پەنا بەخوا، ئەگەر هەڵەی وا بکەین و تەنها ئەو کەسە گل نەدەینەوە کە شتومەکەکەمان لەلای دۆزیوەتەوە، خۆ ئەگەر وا نەکەین، ئەوە ئیتر ئێمە بەڕاستی ستەمکارین.

(٨٠) ئینجا کاتێک کە نائومێد بوون لە پاشا، لە کەنارێکەوە بۆ خۆیان دەستیان کرد بەچپەو ڕا گۆڕینەوە گەورەکەیان وتی: باشە، ئەی نەتازانی کە بێگومان باوکتان بەڕاستی پەیمانێکی لێ وەرگرتوون و خوایشی کردووە بە شایەت بەسەرتانەوە، پێشتریش ئاشکرایە کە چیتان کرد بە یوسف و پیلانتان گێڕا دژی، ئیتر من هەرگیز ئەم سەر زەمین و وڵاتە بەجێ ناهێڵم هەتا باوکم مۆڵەتم دەدات، یاخود خوا فەرمانێک بدات لە قازانجم بێت، ئەو زاتەش چاکترینی دادوەرانە.

(٨١) بگەڕێنەوە بۆ لای باوکتان و پێی بڵێن: ئەی باوکی بەڕێزمان، بێگومان کوڕەکەت دزی کردو ئێمە ئاگامان لێ نەبووە، جگە لەوەی کە زانیومانە، ئێمە لە شاراوە و نهێنیەکان شارەزا نین (نازانین ئەو کوڕە بۆ وای کرد).

(٨٢) (حەز دەکەیت، لە خەڵکی) ئەو شارەش بپرسە کە ئێمەی لێ بووین، لەو کاروانەش بپرسە کە ئێمەی تێدا بووین و پێکەوە هاتینەوە ئێمە بەدڵنیاییەوە ڕاست دەڵێین و ڕاستگۆشین.

(٨٣) (کاتێک کوڕەکان گەیشتنەوە لای باوکیان و بەسەرهاتەکەیان بۆ گێڕایەوە) وتی: (وانیە) بەڵکو دیسانەوە خۆتان پیلانێکی ترتان ڕێک خستووە، جا چارم نیە خۆگریەکی جوان نەبێت، ئومێدە پەروەردگار هەموویانم بۆ بهێنێتەوە و بەهەموویان شاد ببم، بەڕاستی ئەو زاتە زاناو دانایە.

(٨٤) (ئەوسا چووە کەنارێکەوە) و لێیان دوورکەوتەوەو (بەدەم هەناسەی ساردو ئەسرینەوە) وتی: ئەی داخم بۆ یوسفی نازدار، (لە دڵم دەرناچێت یوسفی جوان خاس و خوانناسم ئەوەندە گریاو فرمێسکی هەڵوەران)، چاوەکانی سپی هەڵگەڕاو ناوی سپیێ تێزاو بینینی نەما لە ناخ و داخ و خەفەت و ئێشدا، هەر خەم و پەژارەی خۆی دەخواردەوە.

(٨٥) (کوڕەکان بەهزەییان بە باوکیاندا هاتەوەو) وتیان: سوێند بەخوا تۆ هەر واز ناهێنێت یادی یوسف دەکەیت و ناوی دەبەیت تا وات لێ دێت پەکت دەکەوێت یاخود تیا لە تیاچووان دەبیت.

(٨٦) (لە وەڵامیاندا) وتی: بەڕاستی من باسی سکاڵاو غەم و پەژارەم هەر بۆ لای خوا دەبەم، ئەوەی من دەیزانم لە لایەن خواوە (لە نەخشە و حیکمەتەکانی، لە پێشهات و ڕووداوەکاندا) ئێوە نایزانن.

يَٰبَنِيَّ ٱذۡهَبُواْ فَتَحَسَّسُواْ مِن يُوسُفَ وَأَخِيهِ وَلَا تَاْيۡـَٔسُواْ مِن رَّوۡحِ ٱللَّهِۖ إِنَّهُۥ لَا يَاْيۡـَٔسُ مِن رَّوۡحِ ٱللَّهِ إِلَّا ٱلۡقَوۡمُ ٱلۡكَٰفِرُونَ ﴿٨٧﴾ فَلَمَّا دَخَلُواْ عَلَيۡهِ قَالُواْ يَٰٓأَيُّهَا ٱلۡعَزِيزُ مَسَّنَا وَأَهۡلَنَا ٱلضُّرُّ وَجِئۡنَا بِبِضَٰعَةٖ مُّزۡجَىٰةٖ فَأَوۡفِ لَنَا ٱلۡكَيۡلَ وَتَصَدَّقۡ عَلَيۡنَآۖ إِنَّ ٱللَّهَ يَجۡزِي ٱلۡمُتَصَدِّقِينَ ﴿٨٨﴾ قَالَ هَلۡ عَلِمۡتُم مَّا فَعَلۡتُم بِيُوسُفَ وَأَخِيهِ إِذۡ أَنتُمۡ جَٰهِلُونَ ﴿٨٩﴾ قَالُوٓاْ أَءِنَّكَ لَأَنتَ يُوسُفُۖ قَالَ أَنَا۠ يُوسُفُ وَهَٰذَآ أَخِيۖ قَدۡ مَنَّ ٱللَّهُ عَلَيۡنَآۖ إِنَّهُۥ مَن يَتَّقِ وَيَصۡبِرۡ فَإِنَّ ٱللَّهَ لَا يُضِيعُ أَجۡرَ ٱلۡمُحۡسِنِينَ ﴿٩٠﴾ قَالُواْ تَٱللَّهِ لَقَدۡ ءَاثَرَكَ ٱللَّهُ عَلَيۡنَا وَإِن كُنَّا لَخَٰطِـِٔينَ ﴿٩١﴾ قَالَ لَا تَثۡرِيبَ عَلَيۡكُمُ ٱلۡيَوۡمَۖ يَغۡفِرُ ٱللَّهُ لَكُمۡۖ وَهُوَ أَرۡحَمُ ٱلرَّٰحِمِينَ ﴿٩٢﴾ ٱذۡهَبُواْ بِقَمِيصِي هَٰذَا فَأَلۡقُوهُ عَلَىٰ وَجۡهِ أَبِي يَأۡتِ بَصِيرٗا وَأۡتُونِي بِأَهۡلِكُمۡ أَجۡمَعِينَ ﴿٩٣﴾ وَلَمَّا فَصَلَتِ ٱلۡعِيرُ قَالَ أَبُوهُمۡ إِنِّي لَأَجِدُ رِيحَ يُوسُفَۖ لَوۡلَآ أَن تُفَنِّدُونِ ﴿٩٤﴾ قَالُواْ تَٱللَّهِ إِنَّكَ لَفِي ضَلَٰلِكَ ٱلۡقَدِيمِ ﴿٩٥﴾

(٨٧) (دوای چەند رۆژێك یـەعقوب فـەرمانیدا بەکورەکانی) و وتی: کورەکـانم بچنـەوە و گـوێ هەڵخەن بۆ یوسف و براکەی، لەسۆزو میـهرەبانی خوایش نائومێد مـەبن، چونکـە بەراسـتی کـەس نائومێد نابێت لە سۆزو میهرەبانی خوا جگە لـە کەسانی خوانەناس و بێ باوەڕ.

(٨٨) کـاتێك (گەیشـتنە میسـر) و چوونـە بارەگای یوسف وتیان: جەنابی پاشا ئێمە و کەس و کارمان نەهاتی و گرانی و کوێرەوەریی زۆرمان تووش هاتووە وکەل و پەلێکی تێکەڵ و پێکـەڵ و بێ نرخیشمان هێنـاوە، کەواتـە چیمـان پێویستە بۆمان بپێوە و خێریشمان پێ بکە، بێگومان خوا پاداشتی خێرخوازان دەداتەوە.

(٨٩) (ئینجا یوسف زانـی کـاتی ئـەوە هـاتووە کە خۆی بناسێنێت بۆیە) وتی: ئایا زانیتان و لـە بیرتانە چیتان کرد بەیوسف و بەبراکـەی کـاتێك ئێوە نەفام بوون و ترسی خواتان لە دڵدا نەبوو؟

(٩٠) (هەموو بەسەرسوڕمانەوە چاویان ئەبڵـەق بوو سەرنجیان داو) وتیان: ئایا بەراسـت، بۆچی تۆ یوسفیت؟! وتی: بەڵێ، من یوسـفم و ئەمـەش (بنیامین)ی برامـە، بەراسـتی خـوای میـهرەبان ڕێزی لێناوین و بەهرەمەندی کردووین، بێگومـان ئەوەی خۆپارێز بێت لە گونـاهو خۆگـر بێـت (لـە بەرامبەر پێشهاتەکانەوە، خوای گەورە دەرووی لێ دەکاتەوە) ئەوە بەراستی خوا پاداشـتی چاکـەکاران و چاکـەخوازان بەزایە نادات.

(٩١) ئینجا براکانی وتیان: سوێندمان بەخوا بەڕاستی خوای گەورە ڕێـزی تـۆی داوە بەسـەر ئێمـەدا، ئێمـە بەراسـتی کاتی خۆی بەهەڵەدا چووین و گوناهبارین.

(٩٢) یوسف وتی: خەمتان نەبێت ئەمڕۆ ئیتر هیچ سەر زەنشتێکتان لەسەر نی‌یە، خوا لێتان خۆش بێـت، بێگومـان ئەو زاتە لە هەموو میهرەبانان میهرەبانترە.

(٩٣) (یوسف هەواڵی باوکی پرسی، کە زانی نابینا بووە ووتـی): بـڕۆن و ئـەم کراسـەم بـەرن و بیـدەن بەسـەرو رووی باوکمدا بینایی بۆ دەگەڕێتەوە و چاوی چاك دەبێتەوە، پاشان هەموو کەس و کارتانم بۆ بهێنن بەگشتی.

(٩٤) کاتێك کاروان ئاوەدانی بەجێهێشت و کەوتە ڕێ، باوکیان وتی: بەراستی من هەسـت بـە بۆنـی یوسف دەکـەم ئەگەر بەبێ هۆش و خەڵەفاوم نەزانن و (بڕوام پێبکەن).

(٩٥) ئەو کەسانەی کە لە لای بوون وتیان: سوێند بەخوا بێگومان تۆ هەر لـە نـاو سـەرگەردانی و خەیاڵـە کۆنـەکـەی خۆتدایت!!

فَلَمَّآ أَن جَآءَ ٱلۡبَشِيرُ أَلۡقَىٰهُ عَلَىٰ وَجۡهِهِۦ فَٱرۡتَدَّ بَصِيرٗاۖ قَالَ أَلَمۡ أَقُل لَّكُمۡ إِنِّيٓ أَعۡلَمُ مِنَ ٱللَّهِ مَا لَا تَعۡلَمُونَ ﴿٩٦﴾ قَالُواْ يَٰٓأَبَانَا ٱسۡتَغۡفِرۡ لَنَا ذُنُوبَنَآ إِنَّا كُنَّا خَٰطِـِٔينَ ﴿٩٧﴾ قَالَ سَوۡفَ أَسۡتَغۡفِرُ لَكُمۡ رَبِّيٓۖ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلۡغَفُورُ ٱلرَّحِيمُ ﴿٩٨﴾ فَلَمَّا دَخَلُواْ عَلَىٰ يُوسُفَ ءَاوَىٰٓ إِلَيۡهِ أَبَوَيۡهِ وَقَالَ ٱدۡخُلُواْ مِصۡرَ إِن شَآءَ ٱللَّهُ ءَامِنِينَ ﴿٩٩﴾ وَرَفَعَ أَبَوَيۡهِ عَلَى ٱلۡعَرۡشِ وَخَرُّواْ لَهُۥ سُجَّدٗاۖ وَقَالَ يَٰٓأَبَتِ هَٰذَا تَأۡوِيلُ رُءۡيَٰيَ مِن قَبۡلُ قَدۡ جَعَلَهَا رَبِّي حَقّٗاۖ وَقَدۡ أَحۡسَنَ بِيٓ إِذۡ أَخۡرَجَنِي مِنَ ٱلسِّجۡنِ وَجَآءَ بِكُم مِّنَ ٱلۡبَدۡوِ مِنۢ بَعۡدِ أَن نَّزَغَ ٱلشَّيۡطَٰنُ بَيۡنِي وَبَيۡنَ إِخۡوَتِيٓۚ إِنَّ رَبِّي لَطِيفٞ لِّمَا يَشَآءُۚ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلۡعَلِيمُ ٱلۡحَكِيمُ ﴿١٠٠﴾ ۞ رَبِّ قَدۡ ءَاتَيۡتَنِي مِنَ ٱلۡمُلۡكِ وَعَلَّمۡتَنِي مِن تَأۡوِيلِ ٱلۡأَحَادِيثِۚ فَاطِرَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ أَنتَ وَلِيِّۦ فِي ٱلدُّنۡيَا وَٱلۡأٓخِرَةِۖ تَوَفَّنِي مُسۡلِمٗا وَأَلۡحِقۡنِي بِٱلصَّٰلِحِينَ ﴿١٠١﴾ ذَٰلِكَ مِنۡ أَنۢبَآءِ ٱلۡغَيۡبِ نُوحِيهِ إِلَيۡكَۖ وَمَا كُنتَ لَدَيۡهِمۡ إِذۡ أَجۡمَعُوٓاْ أَمۡرَهُمۡ وَهُمۡ يَمۡكُرُونَ ﴿١٠٢﴾ وَمَآ أَكۡثَرُ ٱلنَّاسِ وَلَوۡ حَرَصۡتَ بِمُؤۡمِنِينَ ﴿١٠٣﴾




(٩٦) ئینجا کە مژدە هێنەرەکە گەیشت و کراسەکەیدا بەسەر دەم و چاویدا، خێرا بینایی بۆ گەڕایەوە، چاوەکانی گەشایەوە، وتی: ئایا من پێم نەوتن، بەراستی ئەوەی من دەیزانم لە لایەن خواوە، ئێوە نایزانن؟!

(٩٧) (دوای ماوەیەک کوڕەکان گەیشتن و هەموو شتێک ئاشکرا بوو) وتیان: ئەی باوکی بەڕێزمان داوای لێخۆشبوونی گوناهەکانمان بۆ بکە (لەخوای میهرەبان) بەڕاستی ئێمە گوناهکار بووین و بەهەڵەدا چوو بووین.

(٩٨) باوکیان وتی: لەداهاتوودا داوای لێ خۆشبوونتان لە پەروەردگارم بۆ دەکەم، بەڕاستی ئەو زاتە لێخۆشبوو میهرەبانە.

(٩٩) ئینجا (کە هەموویان گەیشتنە میسر) چوونە لای یوسف، باوک و دایکی هێنایە نزیکی خۆی و (ڕێزی زۆری بۆ دەربڕین، ئاخر چەندە دڵخۆش و کامەران بووبن، دوای ئەو ماوە دوور و درێژە بەکوڕی جوان کردارو خواناسیان شاد بوون، ئێستاش پاشای میسرە) و پێی وتن: ان شاء اللە، ئەگەر خوا ویستی بێت بەیەکجاریی وەرن بۆ میسرو، بەوپەڕی شادی و ئارامی و کامەرانی نیشتەجێ ببن.

(١٠٠) ئەوسا دایک و باوکی بەرز کردەوە بۆ سەر تەختی پاشایەتی و حوکمڕانی خۆی، هەمووان کڕنووشیان بۆ برد (دیارە کە ئەوسا دروست بووە و نیشانەی ڕێزو پێزانین بووە)، یوسف کە ئەمەی دی وتی: باوکی بەڕێزم ئەمە لێکدانەوەی خەونەکەی ئەوسامە کە بەمنداڵی بینیم، ئەوەتە بێگومان پەروەردگارم هێنایەدی و بەراست دەرچوو، بەراستی ئەو زاتە چاکەی لەگەڵدا کردم و بەسۆز بوو بۆم، کاتێک لە زیندان ڕزگاری کردم، ئەوەتە ئێوەی لە بیابانەوە هێناوەو (بەیەک شادی کردینەوە) دوای ئەوەی شەیتان ئێوانی من و براکانمی تێکدابوو، بەڕاستی پەروەردگارم بەسۆزو بەلوتفە بۆ هەرشتێک کە دەیەوێت (پەلەی نیەو ڕێگەی بەشێنەیی بۆخۆش دەکات)، بێگومان ئەو زاتە زانایە (بەنهێنی و ئاشکرای دروستکراوانی) و دانایە (بەنەخشەی ورد، هەرچی بیەوێت ئەنجامی دەدات).

(١٠١) (ئینجا یوسف پێغەمبەر چووە کەنارەوە و دەستەکانی هەڵبڕی و نزای کردو وتی): پەروەردگارا بەراستی تۆ پاشایەتیت پێ بەخشیم و لە لێکدانەوەی خەو شارەزات کردم، ئەی بەدیهێنەری ئاسمانەکان و زەوی، تۆ پشت و پەنا و یارو یاوەری منیت لە دنیاو قیامەتدا، داواکارم کە بە موسڵمانی بم مرێنیت و بمخەیتە ریزی پاکانەوە و بمگەیەنیت بەکاروانی چاکان.

(١٠٢) ئەی محمد ئەم بەسەرهات و سەرگوزشتەیەی یوسف کە بۆت نیگا دەکەین لە هەواڵ و بەسەرهاتە شاراوەکانە، خۆ تۆ لەلای براکانی یوسف نەبوویت کاتێک کە هەموویان بڕیاریاندا و پیلانیان دەگێڕا...

(١٠٣) (دڵنیاش بە) کە زۆربەی خەڵکی باوەڕدارنین، هەرچەندە تۆ زۆر بەپەرۆش بیت و هەوڵ بدەیت و تێ بکۆشیت.

وَمَا تَسْـَٔلُهُمْ عَلَيْهِ مِنْ أَجْرٍ إِنْ هُوَ إِلَّا ذِكْرٌ لِّلْعَٰلَمِينَ ﴿١٠٤﴾ وَكَأَيِّن مِّنْ ءَايَةٍ فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ يَمُرُّونَ عَلَيْهَا وَهُمْ عَنْهَا مُعْرِضُونَ ﴿١٠٥﴾ وَمَا يُؤْمِنُ أَكْثَرُهُم بِٱللَّهِ إِلَّا وَهُم مُّشْرِكُونَ ﴿١٠٦﴾ أَفَأَمِنُوٓا۟ أَن تَأْتِيَهُمْ غَٰشِيَةٌ مِّنْ عَذَابِ ٱللَّهِ أَوْ تَأْتِيَهُمُ ٱلسَّاعَةُ بَغْتَةً وَهُمْ لَا يَشْعُرُونَ ﴿١٠٧﴾ قُلْ هَٰذِهِۦ سَبِيلِىٓ أَدْعُوٓا۟ إِلَى ٱللَّهِ عَلَىٰ بَصِيرَةٍ أَنَا۠ وَمَنِ ٱتَّبَعَنِى وَسُبْحَٰنَ ٱللَّهِ وَمَآ أَنَا۠ مِنَ ٱلْمُشْرِكِينَ ﴿١٠٨﴾ وَمَآ أَرْسَلْنَا مِن قَبْلِكَ إِلَّا رِجَالًا نُّوحِىٓ إِلَيْهِم مِّنْ أَهْلِ ٱلْقُرَىٰٓ أَفَلَمْ يَسِيرُوا۟ فِى ٱلْأَرْضِ فَيَنظُرُوا۟ كَيْفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ وَلَدَارُ ٱلْـَٔاخِرَةِ خَيْرٌ لِّلَّذِينَ ٱتَّقَوْا۟ أَفَلَا تَعْقِلُونَ ﴿١٠٩﴾ حَتَّىٰٓ إِذَا ٱسْتَيْـَٔسَ ٱلرُّسُلُ وَظَنُّوٓا۟ أَنَّهُمْ قَدْ كُذِبُوا۟ جَآءَهُمْ نَصْرُنَا فَنُجِّىَ مَن نَّشَآءُ وَلَا يُرَدُّ بَأْسُنَا عَنِ ٱلْقَوْمِ ٱلْمُجْرِمِينَ ﴿١١٠﴾ لَقَدْ كَانَ فِى قَصَصِهِمْ عِبْرَةٌ لِّأُو۟لِى ٱلْأَلْبَٰبِ مَا كَانَ حَدِيثًا يُفْتَرَىٰ وَلَٰكِن تَصْدِيقَ ٱلَّذِى بَيْنَ يَدَيْهِ وَتَفْصِيلَ كُلِّ شَىْءٍ وَهُدًى وَرَحْمَةً لِّقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ ﴿١١١﴾

(١٠٤) (ئەی محمد ﷺ) خۆ تۆ هیچ پاداشت و بەخششێکت لێیان ناوێت لەسەر گەیاندنی پەیامەکە، ئەم قورئانە هیچی تر نییە جگە لەوەی کە یادخەرەوەیە بۆ هەموو خەڵکی جیهان.

(١٠٥) چەندەها بەڵگەو نیشانە لە ئاسمانەکان و زەویدا هەن (لەسەر دەسەڵاتداریتی و جوانکاری خوای پەروەردگار) کەچی زۆربەی خەڵکی بەلایدا تێدەپەڕن و تێنافکرن و پشتی تێدەکەن.

(١٠٦) جا زۆربەی زۆری خەڵکی باوەڕناهێنن بە خوای تاک و تەنها، بێ ئەوەی هاوەڵی بۆ بڕیار نەدەن (بێگومان ئیمان و باوەڕی وا هیچ نرخی نیە و خوای گەورە لەو تاوانە خۆش نابێت).

(١٠٧) ئایا ئەوانە لەوە ئەمینن و ناترسن کە سزایەکی خوایی هەموویان بگرێتەوە و (لە ناویان بەرێت)، یاخود کوتوپڕ قیامەت بەرپا ببێت لە کاتێکدا ئەوان هەست بەنزیکی بەرپابوونی نەکەن.

(١٠٨) (ئەی پێغەمبەر ﷺ! تۆ) بڵێ: ئا ئەمە ڕێگەو ڕێبازمە: من و شوێنکەوتوانم بانگ دەکەین بۆ لای خوای پەروەردگار لەسەر بنچینەو بناغەیەکی روون و ئاشکرا، پاکی و بێگەردیش بۆ زاتی پەروەردگارە، من هیچ کاتێک لە موشریک و هاوەڵگەران نیم.

(١٠٩) ئێمە کەسمان نەناردووە لە پێش تۆدا جگە لە پیاوانێک کە هەڵمان بژاردوون لە خەڵکی شارو شوێنەکان و نیگایان بۆ دەنێرین (تا پەیامی ئێمە بەرروونی بگەیەنن)، ئایا نەگەڕاون لە زەویدا، تا تەماشا بکەن و سەرنج بدەن کە: چۆن بوو سەرئەنجامی ئەوانەی پێش ئەمان (کاتێک یاخی بوون)، بێگومان جێگەو ڕێگەو خانووبەرەی بەهەشت لە قیامەتدا چاکترە بۆ ئەوانەی کە خواناس بوون و پارێزکاریان کردووە، ئایا ئەوە عەقڵ و ژیریتان ناخەنەکار؟!.

(١١٠) (ئەی پێغەمبەر ﷺ وا مەزانە کە ئەم ڕێگەیە بەگوڵ و گوڵزار چێنراوە، بەڵکو پڕە لە ناخۆشی و ئازارو گەیشتووەتە رادەیەک کە): هەتا بگرە کاتێک پێغەمبەران تووشی نائومێدی و بێهیوایی دەبن و گومان وادەبەن کە بە ڕاستی ئەوان (بەرنامەکەیان) بە درۆ زانراوە، ئەوە ئا لەو کاتی بێ هیواییەدا، سەرکەوتنی تایبەتی ئێمەیان بۆ دێت، ئەوسا ئەوەی بمانەوێت و شایستەبێت ڕزگاری دەکەین، جا کەس نیە بتوانێت تۆڵەی تونلو تیژی ئێمە لەکەسانی تاوانبارو تاوانکار بگێڕێتەوە و بەرپەرچی بداتەوە.

(١١١) سوێند بێت بەخوا بەڕاستی لە سەرگوزەشتە و بەسەرهاتی پێغەمبەراندا پەندو ئامۆژگاری هەیە بۆ کەسانی ژیرو هۆشمەند، وەنەبێت ئەم قورئانە قسەو باسێک بێت هەڵبەستراببێت، بەڵکو بەڕاست دانەری ئەوەیە کە لە پێش خۆیەوە هاتووە (تەورات و ئینجیل) و روونکەرەوە و جیاکردنەوەی هەموو شتێکی پێویستە لەئایندا، ڕێنومیی و ڕەحمەتیشە بۆ کەسانێک باوەڕ دەهێنن.

سوورەتی (الرعـــد)

بەناوی خوای بەخشندە و میهرەبان

سُورَةُ الرَّعْدِ

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

الٓمٓرۚ تِلْكَ ءَايَٰتُ ٱلْكِتَٰبِۗ وَٱلَّذِىٓ أُنزِلَ إِلَيْكَ مِن رَّبِّكَ ٱلْحَقُّ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يُؤْمِنُونَ ﴿١﴾ ٱللَّهُ ٱلَّذِى رَفَعَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ بِغَيْرِ عَمَدٍ تَرَوْنَهَاۖ ثُمَّ ٱسْتَوَىٰ عَلَى ٱلْعَرْشِۖ وَسَخَّرَ ٱلشَّمْسَ وَٱلْقَمَرَۖ كُلٌّ يَجْرِى لِأَجَلٍ مُّسَمًّىۚ يُدَبِّرُ ٱلْأَمْرَ يُفَصِّلُ ٱلْءَايَٰتِ لَعَلَّكُم بِلِقَآءِ رَبِّكُمْ تُوقِنُونَ ﴿٢﴾ وَهُوَ ٱلَّذِى مَدَّ ٱلْأَرْضَ وَجَعَلَ فِيهَا رَوَٰسِىَ وَأَنْهَٰرًاۖ وَمِن كُلِّ ٱلثَّمَرَٰتِ جَعَلَ فِيهَا زَوْجَيْنِ ٱثْنَيْنِۖ يُغْشِى ٱلَّيْلَ ٱلنَّهَارَۚ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَٰتٍ لِّقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ ﴿٣﴾ وَفِى ٱلْأَرْضِ قِطَعٌ مُّتَجَٰوِرَٰتٌ وَجَنَّٰتٌ مِّنْ أَعْنَٰبٍ وَزَرْعٌ وَنَخِيلٌ صِنْوَانٌ وَغَيْرُ صِنْوَانٍ يُسْقَىٰ بِمَآءٍ وَٰحِدٍ وَنُفَضِّلُ بَعْضَهَا عَلَىٰ بَعْضٍ فِى ٱلْأُكُلِۚ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَٰتٍ لِّقَوْمٍ يَعْقِلُونَ ﴿٤﴾ ۞ وَإِن تَعْجَبْ فَعَجَبٌ قَوْلُهُمْ أَءِذَا كُنَّا تُرَٰبًا أَءِنَّا لَفِى خَلْقٍ جَدِيدٍۗ أُو۟لَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ بِرَبِّهِمْۖ وَأُو۟لَٰٓئِكَ ٱلْأَغْلَٰلُ فِىٓ أَعْنَاقِهِمْۖ وَأُو۟لَٰٓئِكَ أَصْحَٰبُ ٱلنَّارِۖ هُمْ فِيهَا خَٰلِدُونَ ﴿٥﴾



(١) سەرنجی سەرەتای سوورەتی (البقرة) بدە، ئەوەی لـەم کتێبـەدا هەیـە ئایاتـەکانی قورئـانی پیرۆزە و ئەوەی کە لە سەرانسەری ئەم قورئانەدا بـۆ تـۆ ئـەی پێغەمبـەر ﷺ دابـەزێنراوە لەلایـەن پەروەردگارتـەوە، راسـتی و حەقیقەتـە، بـەڵام زۆربەی خەڵکی باوەڕ ناهێنن.

(٢) خوا ئەو زاتەیە کە بـەچاوی خۆتـان دەبینـن چۆن ئاسمانەکانی بەبێ کۆڵەکـە و ستوون بـەرز کردۆتەوە و رایگرتووە، لەوەودوا لەسـەر تـەختی فـەرمانڕەوایی وەسـتاوە (ئەڵبەتـە چۆنیـەتی وەستان و تەختی فەرمانڕەوایەتی و گـەلێ شـتی لەو بابەتانـە لـە رادەی بۆچوونـی ئێمـە بـەدەرە، تەفسیری ئەم ئایەتـەیان لـە پێشـەوا مـالیك پرسیووە، لـە وەڵامـدا وتوویـەتی: وەسـتانەکە حەقیقـەتی هەیـە، چۆنیەتیەکـەی شـاراوەیە، پرسیارکردن دەربارەی بیدعەیە، باوەڕ بوون پێـی واجـبە)، خۆرو مانگیشی رام هێنـاوە، هـەر یەکەیان لە چەرخ و خولی خۆیاندا بـێ وچـان تـا ماوەیەکی دیاریکراو دەسوڕێنەوە، هـەر ئەوزاتـە کاروباری جیهان هەر هـەمووی بـەڕێ دەکـات و رێکـی دەخـات، هـەروەها ئایەتـەکانی قورئـان بەوردی و دوورو درێژی دەخاتە بەرچاو بۆ ئەوەی دڵنیابن لە بە خزمەت گەیشتن و ئامادە بوونی بەردەم دادگای پەروەردگارتان (بۆ لێپرسینەوە).

(٣) هەر ئەو زاتەشە کە زەوی پان و بەرین کردوە و (هەرچەندە لە شێوەی گۆدایە)، کەژو چیـاو رووبـاری زۆری تێـدا دابین کردووە، لە هـەموو بـەرو بوومێـك جووتـی فەراهـەم هێنـاوە لـە هـەردوو جـۆرە، شـەوی والێکـردووە کـە رۆژ داپۆشێت، بەڕاستی ئا لەو شتانەدا بەڵگە و نیشانەی زۆر هەن بۆ کەسانێك بیربکەنەوە.

(٤) لەسەر رووکاری زەوی پارچەی جۆراوجۆر هەیە لە پاڵ یەکدا (کە کارکردیان هەیـە لەسـەر چۆنیـەتی و بەرهـەمی رووەك، جگە لەوەی جیاوازییان نیشانەن بۆ کانزا جۆراو جۆرەکان)، هەروەها باخی رەزی ترێ، کشـتوکاڵی هەمـەجۆر لە دانەوێڵە و بێستانەکاندا، دارخورمای یەك قەدو دوو قەد، هەموو ئەمانە بەیەك ئاو ئاودێر دەکرێن و لە یەك جـۆر ئاو دەخۆنەوە (بەڵام سەرئەنجام ئەو هەموو بەروبوومە جیـاوازە لـە قـەبارەو تـام و بـۆن و رەنـگ و شێوازدا، پەیدا دەبن) و هەندێکیانمان لە هەندێکی تر بۆ خۆراکی ئادەمیزاد نازدارتر و پەسەندتر کردووە، بەڕاستی ئا لەو شتانەشـدا بەڵگە و نیشانەی زۆر هەن بۆ کەسانێك عەقڵ و ژیری خۆیان بخەنەکار.

(٥) خۆ ئەگەر تۆ بەشتێك سەرسام بیت و پێت سەیربێت، ئەوە قسەی بێباوەڕان جێگەی سەرسامیە کە دەڵێن: ئایـا کاتێك بووینەوە بەخاك و خۆڵ، سەر لە نوێ ئایا زیندوو دەکرێینەوەو دروست دەبینەوە؟ ئا ئەوانە (کـە ئـەو قسـەیە دەکەن) ئەوانەن کە بێ باوەڕ بوون بە پەروەردگاریان، ئا ئەوانە زنجیرەکان لـە گـەردنیاندان و ئەوانـە نیشـتەجێی نـاو ئاگری دۆزەخن و هەمیشە دەبێ تیایدا بمێننەوە.

وَيَسْتَعْجِلُونَكَ بِالسَّيِّئَةِ قَبْلَ الْحَسَنَةِ وَقَدْ خَلَتْ مِن قَبْلِهِمُ الْمَثُلَاتُ وَإِنَّ رَبَّكَ لَذُو مَغْفِرَةٍ لِّلنَّاسِ عَلَىٰ ظُلْمِهِمْ وَإِنَّ رَبَّكَ لَشَدِيدُ الْعِقَابِ ﴿٦﴾ وَيَقُولُ الَّذِينَ كَفَرُوا لَوْلَا أُنزِلَ عَلَيْهِ آيَةٌ مِّن رَّبِّهِ إِنَّمَا أَنتَ مُنذِرٌ وَلِكُلِّ قَوْمٍ هَادٍ ﴿٧﴾ اللَّهُ يَعْلَمُ مَا تَحْمِلُ كُلُّ أُنثَىٰ وَمَا تَغِيضُ الْأَرْحَامُ وَمَا تَزْدَادُ وَكُلُّ شَيْءٍ عِندَهُ بِمِقْدَارٍ ﴿٨﴾ عَالِمُ الْغَيْبِ وَالشَّهَادَةِ الْكَبِيرُ الْمُتَعَالِ ﴿٩﴾ سَوَاءٌ مِّنكُم مَّنْ أَسَرَّ الْقَوْلَ وَمَن جَهَرَ بِهِ وَمَنْ هُوَ مُسْتَخْفٍ بِاللَّيْلِ وَسَارِبٌ بِالنَّهَارِ ﴿١٠﴾ لَهُ مُعَقِّبَاتٌ مِّن بَيْنِ يَدَيْهِ وَمِنْ خَلْفِهِ يَحْفَظُونَهُ مِنْ أَمْرِ اللَّهِ إِنَّ اللَّهَ لَا يُغَيِّرُ مَا بِقَوْمٍ حَتَّىٰ يُغَيِّرُوا مَا بِأَنفُسِهِمْ وَإِذَا أَرَادَ اللَّهُ بِقَوْمٍ سُوءًا فَلَا مَرَدَّ لَهُ وَمَا لَهُم مِّن دُونِهِ مِن وَالٍ ﴿١١﴾ هُوَ الَّذِي يُرِيكُمُ الْبَرْقَ خَوْفًا وَطَمَعًا وَيُنشِئُ السَّحَابَ الثِّقَالَ ﴿١٢﴾ وَيُسَبِّحُ الرَّعْدُ بِحَمْدِهِ وَالْمَلَائِكَةُ مِنْ خِيفَتِهِ وَيُرْسِلُ الصَّوَاعِقَ فَيُصِيبُ بِهَا مَن يَشَاءُ وَهُمْ يُجَادِلُونَ فِي اللَّهِ وَهُوَ شَدِيدُ الْمِحَالِ ﴿١٣﴾

(٦) (لارو وێری خوانەناسان گەیشتۆتە رادەیەک کە): پەلەت لێدەکەن لە پێشهاتنی بەڵاو ناخۆشی پێش ئەوەی داوای چاکە و خۆشی بکەن، لەکاتێکدا بێگومان لە پێشینانەوە نموونەی تیاچوون و ریسوا بوونی خوانەناسان تێپەڕ بووە، بێگومان پەروەردگاری تۆ (ئەی پێغەمبەرﷺ) خاوەنی چاوپۆشی و لێخۆشبوونە بۆ خەڵکی، سەرەڕای ستەمیان (ئەگەر بگەڕێنەوە بۆ لای ئیمان و خواناسی)، بەڕاستی پەروەردگاری تۆ زۆر تۆڵە سێنەرێکی بەهێزە (لەو کەسانەی کە دژایەتی بەرنامە بە نرخەکەی دەکەن).

(٧) ئەوانەی کە بێباوەڕ بوون دەڵێن: ئەوە بۆ بەڵگەو نیشانەیەک لەلایەن پەروەردگاریەوە دانەبەزێنرایە سەری (کە پێغەمبەری خوایە) بێگومان، ئەی محمد ﷺ تۆ تەنها ترسێنەرو بێدارکەرەوەی ئەو خەڵکەیت، بۆ هەر میللەتێک پێغەمبەرو چاوساغ و ڕێپیشاندەرێک هەیە.

(٨) خوا چاک دەزانێت بەوەی هەموو مێینەیەک چی لە سکیدا هەڵگرتووە (نێرە یان مێ، تەواوە، یان ناتەواو، رەنگی رووخساری، قەبارەی... تد) هەروەها دەزانێت بەوەش کە دەپوکێتەوەو لەبار دەچێت و بەوەش کە زیاد دەکات و گەورە دەبێت، هەموو شتێک لای ئەو زاتە بەئەندازە و پێوانەیە.

(٩) ئەو زاتە زانای نهێنی و شاراوەکانە هەروەها زانای ناشکراو بینراوەکانیشە، زاتێکی زۆر گەورەو بەشکۆو بڵندو پایەدارە.

(١٠) چونیەکە لای ئەو زاتە، ئەگەر کەسێکتان قسە بشارێتەوە، یان بیڵێت و ناشکرای بکات، هەروەها ئاگاداری ئەو کەسەیە کە لە تاریکی شەودا خۆی دەشارێتەوە، ئەوەش کە بەڕۆژدا دەڕواو ناشکراو دیارە.

(١١) بۆ خوا هەیە فریشتەی بێ شومار کە بە نۆرە بە دوای یەکدا دێن تا چاودێری ئادەمیزاد بکەن لە بەرو پشت و لە هەموو لایەکەوە بیپارێزن بە فەرمانی خوا، بێگومان خوا باروودۆخی هیچ قەوم و گەلێک ناگۆڕێت (لە خۆشیەوە بۆ ناخۆشی، یان لە زەلیلیەوە بۆ سەربەرزی، یان لە گرانیەوە بۆ هەرزانی) هەتا ئەوان ئەوەی بە خۆیان دەکرێت نەیگۆڕن و نەیکەن، کاتێکیش خوا بیەوێت بەڵایەک بەسەر هەر میللەتێکدا بهێنێت (لە دەرئەنجامی سەرکەشی و یاخیبوونیان)، ئەوە هیچ هێزێک ناتوانێت بەری بگرێت، هیچ کەسیش ناتوانێت جگە لە خوا فریایان بکەوێت و رزگاریان بکات.

(١٢) خوا ئەو زاتەیە کە هەورە بروسکەتان نیشان دەدات، هاوڕێ لەگەڵ ترسدا (بەهۆی رووناکی بەهێزو دەنگی سامناکی، کە دەوریان هەیە لە بەپیز کردنی خاکی زەوی و تەقاندنەوەی تۆوەکاندا) هەروەها ئومێد و هیوا بەخشیشە (بە ساڵێکی پڕ بەرەکەت)، هەر ئەو زاتە هەوری قورس و سەنگین و ئاودار بەدی دەهێنێت.

(١٣) هەورە تریشقە (بەدەنگی گەورە و سامناکی) تەسبیحات و سوپاس و ستایشی (بەدیهێنەری دەکات)و فریشتەکانیش لە ترسی ئەو زاتە (سەرگەرمی تەسبیحات و ستایش و سوپاسگوزارین)، هەروەها (جاری واهەیە) هەورە بروسکە دەنێرێت و دەیماڵێت بەکەسێکدا کە خوا ویستی لەسەرە و رۆژی تەواو بووە (جا لەگەڵ ئەم هەموو بەڵگەو نیشانە بەهێزەدا) ئەوانە هەر لە دەمەدەمێ و مشتومڕدان دەربارەی خوا (دوور لە بنەمای زانستی) لەکاتێکدا ئەو زاتە دەسەڵاتی زۆر بەهێزە و تۆڵەسەندنی (لە خوانەناسان) توندو تیژە.

لَهُۥ دَعْوَةُ ٱلْحَقِّ ۖ وَٱلَّذِينَ يَدْعُونَ مِن دُونِهِۦ لَا يَسْتَجِيبُونَ لَهُم بِشَىْءٍ إِلَّا
كَبَٰسِطِ كَفَّيْهِ إِلَى ٱلْمَآءِ لِيَبْلُغَ فَاهُ وَمَا هُوَ بِبَٰلِغِهِۦ ۚ وَمَا دُعَآءُ ٱلْكَٰفِرِينَ
إِلَّا فِى ضَلَٰلٍ ﴿١٤﴾ وَلِلَّهِ يَسْجُدُ مَن فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ طَوْعًا
وَكَرْهًا وَظِلَٰلُهُم بِٱلْغُدُوِّ وَٱلْءَاصَالِ ۩ ﴿١٥﴾ قُلْ مَن رَّبُّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ



وَٱلْأَرْضِ قُلِ ٱللَّهُ ۚ قُلْ أَفَٱتَّخَذْتُم مِّن دُونِهِۦٓ أَوْلِيَآءَ لَا يَمْلِكُونَ لِأَنفُسِهِمْ
نَفْعًا وَلَا ضَرًّا ۚ قُلْ هَلْ يَسْتَوِى ٱلْأَعْمَىٰ وَٱلْبَصِيرُ أَمْ هَلْ تَسْتَوِى
ٱلظُّلُمَٰتُ وَٱلنُّورُ ۗ أَمْ جَعَلُوا۟ لِلَّهِ شُرَكَآءَ خَلَقُوا۟ كَخَلْقِهِۦ فَتَشَٰبَهَ ٱلْخَلْقُ
عَلَيْهِمْ ۚ قُلِ ٱللَّهُ خَٰلِقُ كُلِّ شَىْءٍ وَهُوَ ٱلْوَٰحِدُ ٱلْقَهَّٰرُ ﴿١٦﴾ أَنزَلَ مِنَ
ٱلسَّمَآءِ مَآءً فَسَالَتْ أَوْدِيَةٌۢ بِقَدَرِهَا فَٱحْتَمَلَ ٱلسَّيْلُ زَبَدًا رَّابِيًا ۚ
وَمِمَّا يُوقِدُونَ عَلَيْهِ فِى ٱلنَّارِ ٱبْتِغَآءَ حِلْيَةٍ أَوْ مَتَٰعٍ زَبَدٌ مِّثْلُهُۥ ۚ كَذَٰلِكَ
يَضْرِبُ ٱللَّهُ ٱلْحَقَّ وَٱلْبَٰطِلَ ۚ فَأَمَّا ٱلزَّبَدُ فَيَذْهَبُ جُفَآءً ۖ وَأَمَّا مَا
يَنفَعُ ٱلنَّاسَ فَيَمْكُثُ فِى ٱلْأَرْضِ ۚ كَذَٰلِكَ يَضْرِبُ ٱللَّهُ ٱلْأَمْثَالَ ﴿١٧﴾
لِلَّذِينَ ٱسْتَجَابُوا۟ لِرَبِّهِمُ ٱلْحُسْنَىٰ ۚ وَٱلَّذِينَ لَمْ يَسْتَجِيبُوا۟ لَهُۥ
لَوْ أَنَّ لَهُم مَّا فِى ٱلْأَرْضِ جَمِيعًا وَمِثْلَهُۥ مَعَهُۥ لَٱفْتَدَوْا۟ بِهِۦٓ ۚ
أُو۟لَٰٓئِكَ لَهُمْ سُوٓءُ ٱلْحِسَابِ وَمَأْوَىٰهُمْ جَهَنَّمُ ۖ وَبِئْسَ ٱلْمِهَادُ ﴿١٨﴾

(١٤) هەر بۆ خوایە بانگەوازی حەق و راستی، (بەلام) ئەوانەی هاناو هاوار بۆ کەسێکی تر دەبەن جگە لەو زاتە، هاوار لێکراوان بەهیچ شێوەیەک بەهانایانەوە نایەن و وەلامیان نادەنەوە، مەگەر وەکو کەسێک (تینووی بێت لە دوورەوە) دەستەکانی درێژ بکات بۆ ئاو تا بیگەیەنێتە دەمی، کەچی بێسوودەو ناگاتە دەمی، بێگومان دوعاو نزای بێباوەڕان تەنها لەناو تاریکی و گومڕاییدایە و هیچی تر نییە.

(١٥) هەرچی لە ئاسمانەکان و زەویدا هەیە، لەسەر ڕەزامەندیی خۆیان بێ یان بەناچاریی سوژدە بۆ خوای بەدیهێنەر دەبەن هاوڕێ لەگەڵ سێبەرەکانیاندا لە بەرەبەیان و دەمەو ئێواراندا.

(١٦) (ئەی محمد ﷺ بە خوانەناسان) بڵێ: کێ پەروەردگاری ئاسمانەکان و زەویە؟ (ئەگەر ئەوان بێ دەنگ بوون) تۆ بڵێ: ﷲ پەروەردگاریانە، (چونکە ئەوانە کەرو کوێرو لاڵن لەوانەیە دان بەو ڕاستیەدا نەنێن) پاشان پێیان بڵێ: ئایا ڕەوایە جگە لەو خوایە پشت بەشتانی تر ببەستن و بیانکەنە پشتیوان و خۆشەویست، کە ئەوانە تەنانەت بۆ خۆشییان قازانج و زەرەریان بەدەست نیە؟! هەروەها بڵێ: باشە ئاخر کوێر و چاو ساغ وەک یەکن؟! تاریکی و ڕووناکی چوونیەکن؟! (دیارە خوانەناسی و بێ دینی کوێری و تاریکیە، ئیمان و باوەڕو خواناسیش چاو ساغی و ڕووناکیە)، بەڵکو چەند هاوبەشێکیان داناوە بۆ خوا، کەشتیان دروستکردووە وەک دروستکراوەکانی خواو جیا دروستکراوەکیان لێ شێواوە، پێیان بڵێ: ﷲ بەدیهێنەرو دروستکاری هەموو شتێکە و ئەوزاتە تاکوتەنهاو بەدەسەلات و بەهێزو بە توانایە.

(١٧) هەر ئەو زاتە لە ئاسمانەوە بارانی باراندووە، بەئەندازەی ئەو دۆڵ و نشێوە بەهۆی ئەو بارانە پڕ دەبن (ئینجا لافاوێک دروست دەبێت)، ئەو لافاوە کەف و کوڵی بەرز هەڵگرتووە، (ئەمە نموونەی یەکەمی حەق و ناحەقە، بۆنموونەی دووەم دەفەرموێت) هەروەها لەسەر ڕووی ئەو کانزایانەی کە ئاگری تێبەردەدەن و دەیتوێننەوە بەئاگر بۆ دروستکردنی خشڵ وەکو (ئاڵتوون و زیوو پلاتین) یاخود بۆ پێویستی تر(وەکو ئاسن و مس و قورقوشم) کەف و کوڵ دروست دەبێت وەک کەف و کوڵی سەر ئاوەکە، تا بەو شێوەیە خوا نموونە دەهێنێتەوە بۆ حەق و ناحەق، بۆ ڕاست و ناڕاست، جا ئەوەی کەف و کوڵە و بێسوود و بێکەڵکە دەڕوات و دەپوکێتەوە، بەڵام ئەوەی کە سوود بەخش و بەکەڵکە بۆ خەڵکی لەسەر زەویدا هەر ئەوە دەمێنێتەوە، تا بەو شێوەیە خوا نموونە جۆراوجۆرەکان دەهێنێتەوە، (دیارە کە بەتاڵ و ناحەقی کەف و کوڵن و تەمەن کورتان، حەق و ڕاستیش ئاوە پاکەکەیە و کانزا بەسوودەکانن دەمێننەوە لە زەویدا).

(١٨) (هەڵوێستی ئەو خەڵکە لە بەرامبەر بانگەوازی پەروەردگاریانەوە دوو جۆرە) بۆ ئەوانەی کە بەدەم بانگەوازی پەروەردگاریانەوە چوون، هەموو خۆشی و شادی و کامەرانی و ئاسودەییەکیان بۆ ئامادەیە، ئەوانەش کە بەدەم بانگەوازەکەیەوە نەچوون، ئەگەر بەڕاستی خاوەنی هەر هەموو شتێک بن لە زەویداو ئەوەندەی تریشی لەگەڵدا بێت، ئەوە دەیانکردە قوربانی خۆیان و، لە پێناوی ڕزگاری خۆیاندا دەیانبەخشی، (چونکە) ئا ئەو جۆرە کەسانە بە خراپترین شێوە حسابیان لەگەڵدا دەکرێت، سەرئەنجامیش، جێگەیان دۆزەخە، ئای کە شوێنێکی خراپە.



۞ أَفَمَن يَعۡلَمُ أَنَّمَآ أُنزِلَ إِلَيۡكَ مِن رَّبِّكَ ٱلۡحَقُّ كَمَنۡ هُوَ أَعۡمَىٰٓۚ إِنَّمَا يَتَذَكَّرُ أُوْلُواْ ٱلۡأَلۡبَٰبِ ﴿١٩﴾ ٱلَّذِينَ يُوفُونَ بِعَهۡدِ ٱللَّهِ وَلَا يَنقُضُونَ ٱلۡمِيثَٰقَ ﴿٢٠﴾ وَٱلَّذِينَ يَصِلُونَ مَآ أَمَرَ ٱللَّهُ بِهِۦٓ أَن يُوصَلَ وَيَخۡشَوۡنَ رَبَّهُمۡ وَيَخَافُونَ سُوٓءَ ٱلۡحِسَابِ ﴿٢١﴾ وَٱلَّذِينَ صَبَرُواْ ٱبۡتِغَآءَ وَجۡهِ رَبِّهِمۡ وَأَقَامُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَأَنفَقُواْ مِمَّا رَزَقۡنَٰهُمۡ سِرّٗا وَعَلَانِيَةٗ وَيَدۡرَءُونَ بِٱلۡحَسَنَةِ ٱلسَّيِّئَةَ أُوْلَٰٓئِكَ لَهُمۡ عُقۡبَى ٱلدَّارِ ﴿٢٢﴾ جَنَّٰتُ عَدۡنٖ يَدۡخُلُونَهَا وَمَن صَلَحَ مِنۡ ءَابَآئِهِمۡ وَأَزۡوَٰجِهِمۡ وَذُرِّيَّٰتِهِمۡۖ وَٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ يَدۡخُلُونَ عَلَيۡهِم مِّن كُلِّ بَابٖ ﴿٢٣﴾ سَلَٰمٌ عَلَيۡكُم بِمَا صَبَرۡتُمۡۚ فَنِعۡمَ عُقۡبَى ٱلدَّارِ ﴿٢٤﴾ وَٱلَّذِينَ يَنقُضُونَ عَهۡدَ ٱللَّهِ مِنۢ بَعۡدِ مِيثَٰقِهِۦ وَيَقۡطَعُونَ مَآ أَمَرَ ٱللَّهُ بِهِۦٓ أَن يُوصَلَ وَيُفۡسِدُونَ فِي ٱلۡأَرۡضِ أُوْلَٰٓئِكَ لَهُمُ ٱللَّعۡنَةُ وَلَهُمۡ سُوٓءُ ٱلدَّارِ ﴿٢٥﴾ ٱللَّهُ يَبۡسُطُ ٱلرِّزۡقَ لِمَن يَشَآءُ وَيَقۡدِرُۚ وَفَرِحُواْ بِٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا وَمَا ٱلۡحَيَوٰةُ ٱلدُّنۡيَا فِي ٱلۡأٓخِرَةِ إِلَّا مَتَٰعٞ ﴿٢٦﴾ وَيَقُولُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ لَوۡلَآ أُنزِلَ عَلَيۡهِ ءَايَةٞ مِّن رَّبِّهِۦۚ قُلۡ إِنَّ ٱللَّهَ يُضِلُّ مَن يَشَآءُ وَيَهۡدِيٓ إِلَيۡهِ مَنۡ أَنَابَ ﴿٢٧﴾ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَتَطۡمَئِنُّ قُلُوبُهُم بِذِكۡرِ ٱللَّهِۗ أَلَا بِذِكۡرِ ٱللَّهِ تَطۡمَئِنُّ ٱلۡقُلُوبُ ﴿٢٨﴾

(١٩) جا ئایا ئەو کەسەی کـە دڵنیایـە و دەزانێـت بێگومان ئەم قورئانەی کە لەلایەن پەروەردگارتـەوە بۆت دابـەزێنراوە حـەق و راستـەقینەیە، وەکـو ئـەو کەسە وایە کە کوێرە لـە ئاستیدا؟، بەڕاستی هـەر خـاوەن بـیرو هۆشـەکان لەراسـتی تێدەگـەن و تێدەفکرن...

(٢٠) ئەو کەسـانەن وەفـا دەکـەن و بەنەمـەکن لـە بەرامبەر ئەو پەیمانـەوە کـە هەیانـە لەگـەڵ خـوای پـەروەردگارداو، ئـەو پەیمانـەش ناشکێن و بـەڵێن هەڵناوەشێننەوە...

(٢١) ئەوانەشـن کـە هـەرچی خـوا فـەرمانی بـە گەیاندنی داوە دەیگەیەنن و بەدڵ لە پەروەردگاریان دەترسن (نەوەکو لێیان بڕەنجێت)و لە لێپرسینەوەو حسابی توند و تیژی قیامەتیش سڵ دەکەنەوە.

(٢٢) ئەوانەشن کە دانیان بەخۆدا گرت و بـە ئـارام بوون بۆ بەدەستهێنانی ڕەزامەندیی پەروەردگاریان و نوێژەکەشیان بـەچاکی ئـەنجام داوەو لـەو رزق و ڕۆزیەش کە پێمان بەخشیوون بەخشیویانە، بەنهێنی و بەئاشکراو بەچاکەکاری و شـێوازی جـوان پـاڵ بـە نادروستی و هەڵە و خراپکاریەوە دەنێن، ئـا ئەوانـە سـەرەنجامەکەیان ئـەو خانووبـەرە (رازاوەیەیـە لـە بەهەشتدا)...

(٢٣) کـە باخـەکانی بەهەشـتی ـ عەدنـە ـ، بۆیـان ڕازاوەتەوە، بە شادیەوە دەچنە ناوی، هاوڕێ لەگـەڵ هەر کەسێک چاک و پاک و خواناسە لە باووباپیران و هاوسەرانیان و نەوەکانیان، جا فریشـتەکان دەچـن بۆ سەردانیان لە هەموو دەروازەکانەوە...

(٢٤) دەڵێـن: سـڵاوتان لێ بێـت بـە هـۆی خۆگرتنتانـەوە (لـە بەرامبـەر کێشـەکانی ژیـان، لـە بـەرامبەر گاڵـتەجاڕیی خوانەناسـان..) کـەوابوو ئـای چـەندە جێگـە و ڕێگەیەکی خۆشتان بۆ خۆتان مسۆگەر کرد.

(٢٥) (بەڵام) ئەوانەی کە پەیمانی خوا دەشکێنن دوای ئەوەی کە پێشتر توندو تۆڵ بوو(لە سـەروو هەموویانـەوە پـەیمانی فیترەت و بەندایەتی)، هەرچی پەیوەندیەکیش خوا فـەرمانیداوە بەگـەیاندنی ئـەوان دەیـبڕن و دەیپچڕێـنـن، هـەروەها تـۆوی فەسادو گوناهو تاوان دەچێنن لە زەویدا، ئا ئەوانە نەفرەت و خەشمی خوایان لەسەرەو هەروەها جێگە و ڕێگـەی نـاخۆش و نالەبار (لە دۆزەخدا) بۆ ئەوان هەیە.

(٢٦) هەر خوایە، رزق و ڕۆزی فراوان دەبەخشێت بە هەر کەس کە بیـەوێت و تـەنگ و کـەمی دەکاتـەوە (بەشـێوەیەک کە حیکمەت و دانایی تێدا بەدی دەکرێت) کەچی زۆربەی خەڵکی دڵخۆشن بەژیانی دنیا، لەکاتێکدا کە ژیانی دنیا لـە بەرامبـەر ژیانی قیامەتەوە (لە بەهەشتی بەریندا) تەنها رابواردنێکی کەم نەبێت هیچی تر نی یە.

(٢٧) خوانەناسان دەڵێن: ئـەوە بۆچی موعجیزەیەک بـۆ محمد ﷺ لەلایـەن پەروەردگاریـەوە دانەبەزێنرایـە سـەری، (بـە مەرجێک ـ موعجیزە ـ هیچ کـات نـەبووەتە هۆی ئیمان هێنانی خەڵکی، بەڵکو بیانویەکە و هەمیشـە خوانەناسـان وڕکیـان لێ گرتووە) تۆش پێیان بڵێ: بەڕاسـتی خـوا، هەرکەسـێک کـە بیـەوێت گومـڕاو سەرلێشـێواوی دەکـات، لـە هـەمان کـاتدا هیدایەتی ئەو کەسانە دەدات کە ڕوو لە پەیامەکەی دەکەن و بەندایەتی دەکەن و گەڕاونەتەوە بۆ لای...

(٢٨) ئەوانەی بـاوەڕیـان هێناوەو دڵ و دەروونیـان ئـارام دەبێـت بـە قورئـان و پەیامەکـەی خـوای پـەروەردگار، ئاگـاداربن دڵـەکان: هەر بە قورئان و یادی خواو (پابەندبوون بە ئاینەکەیەوە) خۆشنوود دەبن و دەحەوێنەوە.

ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ طُوبَىٰ لَهُمْ وَحُسْنُ مَـَٔابٍ ﴿٢٩﴾ كَذَٰلِكَ أَرْسَلْنَٰكَ فِىٓ أُمَّةٍ قَدْ خَلَتْ مِن قَبْلِهَآ أُمَمٌ لِّتَتْلُوَاْ عَلَيْهِمُ ٱلَّذِىٓ أَوْحَيْنَآ إِلَيْكَ وَهُمْ يَكْفُرُونَ بِٱلرَّحْمَٰنِ ۚ قُلْ هُوَ رَبِّى لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ عَلَيْهِ تَوَكَّلْتُ وَإِلَيْهِ مَتَابِ ﴿٣٠﴾ وَلَوْ أَنَّ قُرْءَانًا سُيِّرَتْ بِهِ ٱلْجِبَالُ أَوْ قُطِّعَتْ بِهِ ٱلْأَرْضُ أَوْ كُلِّمَ بِهِ ٱلْمَوْتَىٰ ۗ بَل لِّلَّهِ ٱلْأَمْرُ جَمِيعًا ۗ أَفَلَمْ يَاْيْـَٔسِ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَن لَّوْ يَشَآءُ ٱللَّهُ لَهَدَى ٱلنَّاسَ جَمِيعًا ۗ وَلَا يَزَالُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ تُصِيبُهُم بِمَا صَنَعُواْ قَارِعَةٌ أَوْ تَحُلُّ قَرِيبًا مِّن دَارِهِمْ حَتَّىٰ يَأْتِىَ وَعْدُ ٱللَّهِ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُخْلِفُ ٱلْمِيعَادَ ﴿٣١﴾ وَلَقَدِ ٱسْتُهْزِئَ بِرُسُلٍ مِّن قَبْلِكَ فَأَمْلَيْتُ لِلَّذِينَ كَفَرُواْ ثُمَّ أَخَذْتُهُمْ ۖ فَكَيْفَ كَانَ عِقَابِ ﴿٣٢﴾ أَفَمَنْ هُوَ قَآئِمٌ عَلَىٰ كُلِّ نَفْسٍۭ بِمَا كَسَبَتْ ۗ وَجَعَلُواْ لِلَّهِ شُرَكَآءَ قُلْ سَمُّوهُمْ ۚ أَمْ تُنَبِّـُٔونَهُۥ بِمَا لَا يَعْلَمُ فِى ٱلْأَرْضِ أَم بِظَٰهِرٍ مِّنَ ٱلْقَوْلِ ۗ بَلْ زُيِّنَ لِلَّذِينَ كَفَرُواْ مَكْرُهُمْ وَصُدُّواْ عَنِ ٱلسَّبِيلِ ۗ وَمَن يُضْلِلِ ٱللَّهُ فَمَا لَهُۥ مِنْ هَادٍ ﴿٣٣﴾ لَّهُمْ عَذَابٌ فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا ۖ وَلَعَذَابُ ٱلْءَاخِرَةِ أَشَقُّ ۖ وَمَا لَهُم مِّنَ ٱللَّهِ مِن وَاقٍ ﴿٣٤﴾

(٢٩) ئەو کەسانەی کە باوەڕیان هێناوە و کارو کردەوە چاکەکانیان ئەنجامداوە، بەهەشت و نازو نیعمەتی جوان و رازاوە و جێگە و ڕێگەی خۆش بۆیان ئامادەیە.

(٣٠) ئا بەو شێوەیە تۆمان ڕەوانە کردووە بۆ سەر ئوممەتێک کە پێش ئەمان میللەتانی تریش هەبوون، تا ئەم قورئانەی کە بەوەحی بۆمان ڕەوانە کردویت بەسەریاندا بخوێنیتەوە، کەچی زۆربەیان باوەڕ بەخوای میهرەبان ناهێنن، ئەی پێغەمبەر ﷺ تۆ بڵێ: ئەو زاتە پەروەردگاری منە و بێجگە لەو خوایەکی تر نیە، من هەر پشتم بەو زاتە بەستووە، گەڕانەوەشم هەر بۆ لای ئەوە.

(٣١) خۆ ئەگەر بەڕاستی لە جیاتی ئەم قورئانە، خوا قورئانێکی ڕەوانە بکردایە کە کێوەکان پێی بڕۆیشتنایە، یان زەوی پـێ هەڵکەنرایـە و لـەت بکرایـە، یان مردووەکانی پـێ بهاتایەتـە قسـەو گفتوگۆی لەگەڵدا بکرایە، خوانەناسان هەر بڕوایان نەدەهێنا، بەڵام دڵنیابن کە هەموو کارێک و هەموو شتێک بەدەست خوایە، باشە، ئایا ئەوانەی ئیمانیان هێناوە نائومێد نەبوون (لە بێدین و خوانەناسان، خۆ هیدایەت بە زۆر نیە؟) جا ئەگەر خوا بیویستایە هەموو خەڵکی ناچار دەکرد کە هیدایەت وەربگرن(خوانەناسان وەنەبێت ژیانی دنیا بەخۆشی بەرنەسەر، بەڵکو) بەردەوام ئەوانەی کە بێباوەڕ بوون بەڵای سەخت و ناخۆشیان تووش دەبێت بەهۆی ئەو کارو پیشەیەوە کە ئەنجامیان داوە، یاخود ئەو بەڵا سەختانە لە نزیک ماڵەکانیانەوە دادەبەزێت و سەرهەڵدەدات، هەتا بەڵێنی خوا دێتە دی، بەڕاستی خوا پەیمانی ناشکێنێت و دەیهێنێتە دی.

(٣٢) (ئەی پێغەمبەر ﷺ ئەگەر خوانەناسان گاڵتە دەکەن بە تۆ یان بە ئایینەکەی تۆ، خەفەت مەخۆ چونکە) سوێند بەخوا بەڕاستی گاڵتەکراوە بە پێغەمبەرانی پێش تۆش، جا من ماوەیەک مۆڵەتمدا بەوانەی کە بێ باوەڕ بوون پاشان خەشم و قینی خۆمم لێگرتن، جا چۆن تۆڵەیەک بوو تۆڵەکەم؟ (لە مێژوو بپرسە و سەرنجی ناسەواریان بدە)!

(٣٣) جا ئایا ئەو زاتەی کە سەرپەرشتیاری کارو کردەوەی هەموو کەسێکە و دەزانێت چیان کردووە (وەکو پەرستراو و بتەکانی تر وایە کە خەڵکی هانا و هاواری بۆ دەبەن؟)، لەگەڵ گەورەیی و باڵادەستی ئەو پەروەردگارەدا نەفامان شەریکیان بۆ خوا بڕیارداوە، تۆیش بڵێ: ئادەی ناوی ئەو بت و هاوەڵانەم بۆ بنێن کە لە جیاتی خوا دەیانپەرستن؟ یاخود (بە هەموو عەقڵێکتانەوە) دەتانەوێت خوا ئاگادار بکەنەوە بەشتێک کە ئەو زاتە نایزانێت لە زەویدا؟!!، یان هەر ئەتانەوێت ئاگاداری بکەنەوە بەقسەی سەرزارەکیتان، نەخێر ڕاستی هەر ئەوەیە کە فێڵ و تەڵەکە و پیلانی ئەوانەی کە بێ باوەڕ بوون بۆیان ڕازێنراوەتەوە و لە ڕێبازی ڕاست وێڵ کراون، جا هەر کەس بەهۆی کارو کردەوەی خراپیەوە ڕێبازی خوا ون بکات، ئیتر کەس نیە هیدایەتی بدات.

(٣٤) ئەوانە هەر لە دنیادا تووشی سزایەکیان دەکەین، بێگومان سزای قیامەتیشیان سەختترە و هیچ کەس و هیچ شتێک نیە لە سزای سامناکی خوایی ڕزگاریان بکات و پەنایان بدات.



﴿مَّثَلُ ٱلْجَنَّةِ ٱلَّتِى وُعِدَ ٱلْمُتَّقُونَ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ أُكُلُهَا دَآئِمٌ وَظِلُّهَا تِلْكَ عُقْبَى ٱلَّذِينَ ٱتَّقَوا وَّعُقْبَى ٱلْكَٰفِرِينَ ٱلنَّارُ ﴿٣٥﴾ وَٱلَّذِينَ ءَاتَيْنَٰهُمُ ٱلْكِتَٰبَ يَفْرَحُونَ بِمَآ أُنزِلَ إِلَيْكَ وَمِنَ ٱلْأَحْزَابِ مَن يُنكِرُ بَعْضَهُۥ قُلْ إِنَّمَآ أُمِرْتُ أَنْ أَعْبُدَ ٱللَّهَ وَلَآ أُشْرِكَ بِهِۦٓ إِلَيْهِ أَدْعُوا وَإِلَيْهِ مَـَٔابِ ﴿٣٦﴾ وَكَذَٰلِكَ أَنزَلْنَٰهُ حُكْمًا عَرَبِيًّا وَلَئِنِ ٱتَّبَعْتَ أَهْوَآءَهُم بَعْدَ مَا جَآءَكَ مِنَ ٱلْعِلْمِ مَا لَكَ مِنَ ٱللَّهِ مِن وَلِىٍّ وَلَا وَاقٍ ﴿٣٧﴾ وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا رُسُلًا مِّن قَبْلِكَ وَجَعَلْنَا لَهُمْ أَزْوَٰجًا وَذُرِّيَّةً وَمَا كَانَ لِرَسُولٍ أَن يَأْتِىَ بِـَٔايَةٍ إِلَّا بِإِذْنِ ٱللَّهِ لِكُلِّ أَجَلٍ كِتَابٌ ﴿٣٨﴾ يَمْحُوا ٱللَّهُ مَا يَشَآءُ وَيُثْبِتُ وَعِندَهُۥٓ أُمُّ ٱلْكِتَٰبِ ﴿٣٩﴾ وَإِن مَّا نُرِيَنَّكَ بَعْضَ ٱلَّذِى نَعِدُهُمْ أَوْ نَتَوَفَّيَنَّكَ فَإِنَّمَا عَلَيْكَ ٱلْبَلَٰغُ وَعَلَيْنَا ٱلْحِسَابُ ﴿٤٠﴾ أَوَلَمْ يَرَوْا أَنَّا نَأْتِى ٱلْأَرْضَ نَنقُصُهَا مِنْ أَطْرَافِهَا وَٱللَّهُ يَحْكُمُ لَا مُعَقِّبَ لِحُكْمِهِۦ وَهُوَ سَرِيعُ ٱلْحِسَابِ ﴿٤١﴾ وَقَدْ مَكَرَ ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ فَلِلَّهِ ٱلْمَكْرُ جَمِيعًا يَعْلَمُ مَا تَكْسِبُ كُلُّ نَفْسٍ وَسَيَعْلَمُ ٱلْكُفَّٰرُ لِمَنْ عُقْبَى ٱلدَّارِ ﴿٤٢﴾

(٣٥) وێنەو نموونەی ئەو بەهەشتەی بەڵێن دراوە بە پارێزکاران (کە جوان و رازاوەیە) چەندەها رووبار رەوان و جاریە (بەژێر درەختەکان و بە بەردەم کۆشکەکانیدا)، خواردن و خواردنەوەی (هەمەجۆر و هەمەرەنگی) بەردەوامە هاورێ لەگەڵ سێبەری خۆش و(هەوای سازگارو شنەی شەماڵدا) ئەوەیە سەر ئەنجامی ئەوانەی لەتورەیی خوا خۆیان پاراست، سەر ئەنجامی بێ باوەڕ و خوانەناسانیش ئاگری دۆزەخە.

(٣٦) دەستەیەک لەوانەی کەکتێبی ئاسمانیمان پێ بەخشیوون (شوێنکەوتەی حق و راستین) دڵخۆش و شادمان دەبن بەو قورئانەی کە بۆ تۆ دابەزێنراوە، هەندێ گرۆ و دەستەی تریش هەیە ئینکاری هەندێکی دەکات.. پێیان بڵێ: بەڕاستی من فەرمانی ئەوەم پێ دراوە کە تەنها خوا بپەرستم و هیچ شەریک و هاوەڵیشی بۆ بڕیار نەدەم، هەر بۆ لای ئەو خەڵک بانگ بکەم، گەڕانەوەش هەر بۆ لای ئەوە.

(٣٧) هەر بەو شێوەیە (پێشتر کتێبی ئاسمانیمان بە زمانی جۆراو جۆر رەوانە کردووە) قورئانمان وەکو داوەرێک بەعەرەبیەکی پاراو دابەزاندووە، سوێند بە خوا ئەگەر شوێنی ئارەزووەکانی ئەوان بکەویت، دوای ئەوەی زانستی و زانیاری تەواوت (لەلایەن خواوە) بۆ هات، ئەوە هیچ پشتیوان و پارێزەرێکت نییە لە سزای خوا بتپارێزێت.

(٣٨) سوێند بە خوا بێگومان پێش تۆ پێغەمبەرانی ترمان رەوانە کردووە و هاوسەرو ئەوەشمان پێداون، هیچ پێغەمبەرێکیش بۆی نەبووە بەویستی خۆی موعجیزە نیشان بدات ئەگەر ویستی خوای لەسەر نەبووبێت، بۆ هەموو کارو رووداوێکیش بڕیارێکی تایبەت هەیە.

(٣٩) خوا ویستی ئەمانی لەسەر هەرچیەک بێت، لەناوی دەبات و دەیکوژێنێتەوە، یان دەیهێڵێتەوە و پایەداری دەکات، سەرچاوەی تۆمارکراوی هەموو رووداوەکان لای ئەو زاتەیە، (یاخود خوا ئایینە پێشووەکان لە مەیداندا ناهێڵێت و دواهەمین ئاین و بەرنامەی کە ئایینی ئیسلامە دەیچەسپێنێت و پایەداری دەکات).

(٤٠) جا ئەگەر هەندێ لە هەڕەشەکانی خۆمانیان بۆ پێش بهێنین و نیشانت بدەین، یاخود بتمرێنین و سەرئەنجامی ئەوان نەبینیت، خەفەت مەخۆ چونکە بەڕاستی تۆ تەنها گەیاندنی پەیامەکەت لەسەرە، لێپرسینەوەش لەسەر ئێمەیە.

(٤١) ئایا خوانەناسان نەیانبینیوە، ئێمە چۆن ئەم لاو ئەو لای زەوی کەم دەکەینەوە (دەسەلاتی خوانەناسان ناهێڵین لە رۆژهەلات و رۆژئاوای زەویدا، سەرەنجام بەرنامە و ئوممەتی میانەڕە و سەر دەخەین) و خوا خۆی داوەریی دەکات و (گۆڕانکاریەکان تاوتوێ دەکات)، کەس ناتوانێت موحاسەبەی بکات و کۆسپ و تەگەرە بهێنێتە رێی و ئەو زاتە زۆر بەخێرایی هەموو شتێک تاوتوێ دەکات و لە هەمووان دەپرسێتەوە.

(٤٢) بێگومان خوانەناسانی پێش ئەمانیش پیلانیان گێڕا، بەمەرجێک پیلانەکانیان هەر هەمووی لای خوا روون و ئاشکرایە، دەزانێت هەر کەس چی دەکات و چی دەستپێشخەری دەکات، بێباوەڕو خوانەناسانیش لەئایندەدا دەزانن کە سەرەنجامی ئەم جیهانە و ئەو جیهانیش بۆ کێ دەبێت.

وَيَقُولُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ لَسْتَ مُرْسَلًا ۚ قُلْ كَفَىٰ بِٱللَّهِ شَهِيدًۢا بَيْنِى وَبَيْنَكُمْ وَمَنْ عِندَهُۥ عِلْمُ ٱلْكِتَٰبِ ﴿٤٣﴾

سُورَةُ إِبْرَاهِيمَ

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

الٓر ۚ كِتَٰبٌ أَنزَلْنَٰهُ إِلَيْكَ لِتُخْرِجَ ٱلنَّاسَ مِنَ ٱلظُّلُمَٰتِ إِلَى ٱلنُّورِ بِإِذْنِ رَبِّهِمْ إِلَىٰ صِرَٰطِ ٱلْعَزِيزِ ٱلْحَمِيدِ ﴿١﴾ ٱللَّهِ ٱلَّذِى لَهُۥ مَا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِى ٱلْأَرْضِ ۗ وَوَيْلٌ لِّلْكَٰفِرِينَ مِنْ عَذَابٍ شَدِيدٍ ﴿٢﴾ ٱلَّذِينَ يَسْتَحِبُّونَ ٱلْحَيَوٰةَ ٱلدُّنْيَا عَلَى ٱلْءَاخِرَةِ وَيَصُدُّونَ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ وَيَبْغُونَهَا عِوَجًا ۚ أُوْلَٰٓئِكَ فِى ضَلَٰلٍۭ بَعِيدٍ ﴿٣﴾ وَمَآ أَرْسَلْنَا مِن رَّسُولٍ إِلَّا بِلِسَانِ قَوْمِهِۦ لِيُبَيِّنَ لَهُمْ ۖ فَيُضِلُّ ٱللَّهُ مَن يَشَآءُ وَيَهْدِى مَن يَشَآءُ ۚ وَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ ﴿٤﴾ وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا مُوسَىٰ بِـَٔايَٰتِنَآ أَنْ أَخْرِجْ قَوْمَكَ مِنَ ٱلظُّلُمَٰتِ إِلَى ٱلنُّورِ وَذَكِّرْهُم بِأَيَّىٰمِ ٱللَّهِ ۚ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَٰتٍ لِّكُلِّ صَبَّارٍ شَكُورٍ ﴿٥﴾

(٤٣) ئەوانەش کە بێ باوەڕ بوون دەڵێن: تۆ پێغەمبەرو رەوانەکراوی خوا نیت، لە وەلامیاندا بڵێ: هەر خوا بەسە کە شایەت بێت لە نێوان منیش و ئێوەشدا، هەروەها ئەو کەسەش کە شارەزای قورئان و کتێبە ئاسمانیەکانە.

سوورەتی (إبراهیم)

بەناوی خوای بەخشندە و میهرەبان

(١) سەرنجی سەرەتای سورەتی (البقرة) بدە، ئەم قورئانە کتێبێکە دامانبەزاندووە بۆت ئەی محمدﷺ تا خەڵکی لە تاریکیەکانی (بێ باوەڕی و نەزانی و سەرلێشێواوی) دەربهێنیت، بەرەو نوورو رێبازی رۆشنایی ئیمان، بەویستی پەروەردگاریان، تا دەگەنە رێبازی راستی خوای بالادەست و شایستەی سوپاسگوزاری.

(٢) ئەو خوایەی کە هەرچی لە ئاسمانەکان و هەرچی لە زەویدا هەیە هەر ئەو خاوەنیانە، هاوار و ئاهو ناڵە بۆ ئەو کەسانەی کە بێ باوەڕن لە سزایەکی زۆر توندو تیژ...

(٣) ئەوانەی کە ژیانی دنیایان لا بە نرخترو خۆشەویستترە لەژیانی جیهانی دوایی، هەمیشە بەربەست دەخەنە بەر رێبازی خواو دەیانەوێت لە رێڕەوی خۆی دەربچێت و بترازێت، (یاخود پەسەندە لایان، بەلام بەمەرجێک لە خزمەت پلان و نەخشەی ئەواندا بێت) ئا ئەوانە لە گومراییەکی قووڵ و بێ سەرو بندا سەرگەردانن و دەمێننەوە.

(٤) ئێمە هیچ فرستادەیەکمان رەوانە نەکردووە تەنها بەزمانی قەومەکەی نەبێت، (یەکێک بووە لە خۆیان و بە زمانی ئەوان دواوە) تا هەموو شتێکیان بۆ روون بکاتەوە، ئینجا خوای گەورە ئەو کەسەی گومرا کردووە کە ویستوویەتی (چونکە گوێی بۆ بانگەوازی حەق نەگرتووە)، ئەوەش کە ویستوویەتی هیدایەتی داوە (پەروەردگار پاڵپشتی ژیرو هۆشمەندانە)، ئەو زاتەش بالادەستە (ویستی ئەو لە سەروو هەموو ویستەکانەوەیە)، دانایە و (دەزانێت کێ شایستەی ئەو رەحمەتە بەنرخەیە).

(٥) سوێند بەخوا بەڕاستی ئێمە موسامان رەوانە کرد، هاوڕێ لەگەڵ موعجیزەی زۆردا (فەرمانمان پێدا) کە قەوم و عەشرەتت لە تاریکیەکان رزگار بکەو بەرەو نوورو رووناکی بیانبە، رۆژەکانی خوایان بهێنەرەوە یاد (ئەو رۆژانەی کە تۆڵەی لە بێ باوەڕان سەند و ئیمانداران سەرخست)، بێگومان ئا لەو بەسەرهاتانەدا بەڵگە و نیشانەی زۆر هەن، بۆ هەموو ئەو کەسانەی کە زۆر خۆگرن (لەکاتی تەنگانەدا)، زۆر سوپاسگوزاریشن (لەکاتی خۆشیدا).

وَإِذْ قَالَ مُوسَىٰ لِقَوْمِهِ ٱذْكُرُوا۟ نِعْمَةَ ٱللَّهِ عَلَيْكُمْ إِذْ أَنجَىٰكُم مِّنْ ءَالِ فِرْعَوْنَ يَسُومُونَكُمْ سُوٓءَ ٱلْعَذَابِ وَيُذَبِّحُونَ أَبْنَآءَكُمْ وَيَسْتَحْيُونَ نِسَآءَكُمْ ۚ وَفِى ذَٰلِكُم بَلَآءٌ مِّن رَّبِّكُمْ عَظِيمٌ ﴿٦﴾ وَإِذْ تَأَذَّنَ رَبُّكُمْ لَئِن شَكَرْتُمْ لَأَزِيدَنَّكُمْ ۖ وَلَئِن كَفَرْتُمْ إِنَّ عَذَابِى لَشَدِيدٌ ﴿٧﴾ وَقَالَ مُوسَىٰٓ إِن تَكْفُرُوٓا۟ أَنتُمْ وَمَن فِى ٱلْأَرْضِ جَمِيعًا فَإِنَّ ٱللَّهَ لَغَنِىٌّ حَمِيدٌ ﴿٨﴾ أَلَمْ يَأْتِكُمْ نَبَؤُا۟ ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِكُمْ قَوْمِ نُوحٍ وَعَادٍ وَثَمُودَ ۛ وَٱلَّذِينَ مِنۢ بَعْدِهِمْ ۛ لَا يَعْلَمُهُمْ إِلَّا ٱللَّهُ ۚ جَآءَتْهُمْ رُسُلُهُم بِٱلْبَيِّنَٰتِ فَرَدُّوٓا۟ أَيْدِيَهُمْ فِىٓ أَفْوَٰهِهِمْ وَقَالُوٓا۟ إِنَّا كَفَرْنَا بِمَآ أُرْسِلْتُم بِهِۦ وَإِنَّا لَفِى شَكٍّ مِّمَّا تَدْعُونَنَآ إِلَيْهِ مُرِيبٍ ﴿٩﴾ ۞ قَالَتْ رُسُلُهُمْ أَفِى ٱللَّهِ شَكٌّ فَاطِرِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۖ يَدْعُوكُمْ لِيَغْفِرَ لَكُم مِّن ذُنُوبِكُمْ وَيُؤَخِّرَكُمْ إِلَىٰٓ أَجَلٍ مُّسَمًّى ۚ قَالُوٓا۟ إِنْ أَنتُمْ إِلَّا بَشَرٌ مِّثْلُنَا تُرِيدُونَ أَن تَصُدُّونَا عَمَّا كَانَ يَعْبُدُ ءَابَآؤُنَا فَأْتُونَا بِسُلْطَٰنٍ مُّبِينٍ ﴿١٠﴾



(٦) (یادیان بهێنەرەوە) کاتێک موسا بە قومەکەی وت: یادی نازو نیعمەتەکانی خوا بکەنەوە لەسەرتان، کاتێک لە دارو دەستەی فیرعەون رزگاری کردن کە بەناخۆشترین شێوە سزای دەدان، کورانی ئێوەیان سەر دەبڕی و ئافرەتانی ئێوەیان دەهێشتەوە (بۆ کارەکەری)، بێگومان ئا لەو پێشهاتانەدا بەڵاو تاقی کردنەوەیەکی گەورە لەلایەن پەروەردگارتانەوە بۆتان ساز درابوو.

(٧) لە یادتان بێت کە: پەروەردگارتان بڕیاری داوە، سوێند بەخوا ئەگەر سوپاسگوزارو شوکرانە بژێر بن، رزق و رۆزی و نازو نیعمەتتان بەسەردا دەڕژێنم و زیادی دەکەم، بەڵام: ئەگەر ناشوکرو سوپاس ناپەزێر بن، بەڕاستی ئەو کاتە ئیتر تۆڵە و سزای من زۆر بە ئازار دەبێت.

(٨) موسا وتی: خەڵکینە ئەگەر ئێوە و هەموو دانیشتوانی سەر زەوی بەگشتی خوانەناس و بێباوەڕ بن، ئەوە بێگومان هەر خۆتان زەرەر دەکەن، چونکە خوا هەر خۆی بێ نیازە و شایستەی سوپاسە.

(٩) باشە، ئایا هەواڵی قەومە پێشووەکانتان پێ نەگەیشتووە، قەومی (نوح و عاد و ثمود)، ئەوانەش کە لە دوای ئەوان هاتوون، تەنها خوا نەبێت کەس نازانێت چەندە بوون و چیان بەسەر هاتووە، ئەوانە فرستادەکانیان بە بەڵگەی زۆرەوە هاتن دووپاتیان دەکردەوە کە پێغەمبەری پەروەردگارن، کەچی خوانەناسان یان بەدەستیان ئاماژەیان دەکرد بۆ پێغەمبەران کە بێدەنگ بن، یاخود دەستیان دەبرد بۆ دەمی خۆیان و (دەیانکردە فیکە و هۆسە و گاڵتەجاڕی)و دەیانوت: بێگومان ئێمە باوەڕمان بەم پەیام و بەرنامەیە نیە کە بە ئێوەدا رەوانە کراوە، بەڕاستی ئێمەش لە دوو دڵیەکدان کە خەڵکیش دەخاتە گومانەوە لەوەی کە ئێوە بانگەوازی ئێمەی بۆ دەکەن.

(١٠) پێغەمبەرانیان وتیان: باشە، ئاخر گومان لە چی دەکەن؟ ئایا لە خوای پەروەردگاردا گومان هەیە؟! بەدیهێنەری ئاسمانەکان و زەوی؟! ئەو زاتە بانگتان دەکات بۆ ئەوەی لێتان خۆش ببێت، بۆ ئەوەی لە هەڵەو گوناهەکانتان چاوپۆشی بکات و مۆڵەتیشتان دەدات تا کاتێکی دیاریکراو، کەچی (خوانەناسان روو بە پێغەمبەران) وتیان: ئێوە تەنها بەشەرن وەکو ئێمە هیچی ترنین (لەباتی سوپاسی خوا بکەن کە ئەوەندە ئادەمیزاد رێزدارە، نوێنەر لە خۆیان هەڵدەبژێرێت)، کەچی رەخنەیان گرت و وتیان: ئێوە دەتانەوێت رێگرو دژ بەوە بن کە باو و باپیرانمان دەیانپەرست (دەی ئەگەر راست دەکەن) بەڵگەیەکی ئاشکرامان بۆ بهێنن و نیشتمانمان بدەن؟!

قَالَتْ لَهُمْ رُسُلُهُمْ إِن نَّحْنُ إِلَّا بَشَرٌ مِّثْلُكُمْ وَلَٰكِنَّ اللَّهَ يَمُنُّ عَلَىٰ مَن يَشَاءُ مِنْ عِبَادِهِ ۖ وَمَا كَانَ لَنَا أَن نَّأْتِيَكُم بِسُلْطَانٍ إِلَّا بِإِذْنِ اللَّهِ ۚ وَعَلَى اللَّهِ فَلْيَتَوَكَّلِ الْمُؤْمِنُونَ ﴿١١﴾ وَمَا لَنَا أَلَّا نَتَوَكَّلَ عَلَى اللَّهِ وَقَدْ هَدَانَا سُبُلَنَا ۚ وَلَنَصْبِرَنَّ عَلَىٰ مَا آذَيْتُمُونَا ۚ وَعَلَى اللَّهِ فَلْيَتَوَكَّلِ الْمُتَوَكِّلُونَ ﴿١٢﴾ وَقَالَ الَّذِينَ كَفَرُوا لِرُسُلِهِمْ لَنُخْرِجَنَّكُم مِّنْ أَرْضِنَا أَوْ لَتَعُودُنَّ فِي مِلَّتِنَا ۖ فَأَوْحَىٰ إِلَيْهِمْ رَبُّهُمْ لَنُهْلِكَنَّ الظَّالِمِينَ ﴿١٣﴾ وَلَنُسْكِنَنَّكُمُ الْأَرْضَ مِن بَعْدِهِمْ ۚ ذَٰلِكَ لِمَنْ خَافَ مَقَامِي وَخَافَ وَعِيدِ ﴿١٤﴾ وَاسْتَفْتَحُوا وَخَابَ كُلُّ جَبَّارٍ عَنِيدٍ ﴿١٥﴾ مِّن وَرَائِهِ جَهَنَّمُ وَيُسْقَىٰ مِن مَّاءٍ صَدِيدٍ ﴿١٦﴾ يَتَجَرَّعُهُ وَلَا يَكَادُ يُسِيغُهُ وَيَأْتِيهِ الْمَوْتُ مِن كُلِّ مَكَانٍ وَمَا هُوَ بِمَيِّتٍ ۖ وَمِن وَرَائِهِ عَذَابٌ غَلِيظٌ ﴿١٧﴾ مَّثَلُ الَّذِينَ كَفَرُوا بِرَبِّهِمْ ۖ أَعْمَالُهُمْ كَرَمَادٍ اشْتَدَّتْ بِهِ الرِّيحُ فِي يَوْمٍ عَاصِفٍ ۖ لَّا يَقْدِرُونَ مِمَّا كَسَبُوا عَلَىٰ شَيْءٍ ۚ ذَٰلِكَ هُوَ الضَّلَالُ الْبَعِيدُ ﴿١٨﴾

(١١) پێغەمبەرانیان پێیان وتن: ئێمە تەنها بەشەرێکین وەکو ئێوە و هیچی تر، بەلام خوا ویستی هەرکەسێکی ببێت لە بەندەکانی خۆی منەت دەخاتەسەری (هەڵیاندەبژێرێ بۆگەیاندنی پەیامە پیرۆزەکەی)، ئێمە بۆمان نەبووە هیچ بەڵگە و موعجیزەیەکتان بۆ بهێنین مەگەر بە ویست و مۆڵەتی خوا نەبێت، دەبا ئەوانەی کە ئیماندارن هەر پشت بەخوا ببەستن.

(١٢) جا ئەوە چیمان هەیە ئێمە ئەگەر پشت بە پەروەردگاری مەزن نەبەستین، لەکاتێکدا کە بەراستی ئەو زاتە هیدایەت و ڕێنموویی کردووین بۆ هەموو ڕێگەو ڕێبازێکی چاک و بەسوود، مەرج بێت لە بەرامبەر ئەو هەموو ناخۆشی و ئازارەوە کە ئێوە بۆ ئێمەتان پێش هێنا، خۆگرو بەئارام بین، دەبا ئەوانەی کە پشتیوانیان پێویستە هەر پشت بەخوا ببەستن.

(١٣) ئەوانەش کە بێباوەڕ بوون بەپێغەمبەرانی خۆیانیان وت: (ئەگەر کۆڵ نەدەن) بەراستی لە ولاتمان دەرتان دەکەین، یان دەبێت بێنەوە ڕیزی ئاینەکەی ئێمە، ئەوسا پەروەردگاریان پەیامی بۆ ناردن کە: دڵنیابن ئێمە ستەمکاران (بەم زووانە) لەناو دەبەین و دەیانفەوتێنین...

(١٤) بێگومان نیشتەجێتان دەکەین لەو ولاتەدا لە دوای ئەوان، ئەوەش بۆ هەموو ئەو کەسانەیە کە لە وەستانیان لە بەردەم دەسەلاتی مندا دەترسن و لە هەڕەشەکانی من بیم و ترسیان هەیە.

(١٥) ئەوسا ئیتر پێغەمبەران داوای سەرکەوتنیان لە پەروەردگاریان کردو هەموو زۆردارو ستەمکارو سەرسەخت و دڵ ڕەشێک نائومێد و مایەپووچ بوو.

(١٦) (هەریەک لەوانە) لە داهاتوودا دۆزەخ چاوەڕێیەتی و تیایدا کێم و زووخاوی دەرخوارد دەدرێت...

(١٧) جا ئەو کێم و زووخاوە قوم قوم بەناچاریی دەخواتەوەو بەئاسانی بۆی قوت نادرێت، مەرگیش لە هەموو لایەکەوە هێرشی بۆ دەهێنێت، کەچی ناشمرێت، لەوەودواش سزاو ئازاری هەمەجۆرو ناخۆش و گران یەخەی بەرنادات.

(١٨) نموونەی ئەوانەی کە باوەڕیان نەهێناوە بەپەروەردگاریان، کردەوەکانیان وەکو خۆڵەمێشێک وایە کە لە ڕەشەبایەکی سەخت لە ڕۆژێکی گەردەلوودا بەتوندی لێی بدات، لەو هەوڵ و کۆششەی کە داویانە بۆ دنیا هیچیان دەست ناکەوێت، ئا ئەوەیە گومڕایەک کە لە حەق و ڕاستیەوە دوورە.

أَلَمْ تَرَ أَنَّ ٱللَّهَ خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ بِٱلْحَقِّ ۚ إِن يَشَأْ يُذْهِبْكُمْ وَيَأْتِ بِخَلْقٍ جَدِيدٍ ﴿١٩﴾ وَمَا ذَٰلِكَ عَلَى ٱللَّهِ بِعَزِيزٍ ﴿٢٠﴾ وَبَرَزُوا۟ لِلَّهِ جَمِيعًا فَقَالَ ٱلضُّعَفَٰٓؤُا۟ لِلَّذِينَ ٱسْتَكْبَرُوٓا۟ إِنَّا كُنَّا لَكُمْ تَبَعًا فَهَلْ أَنتُم مُّغْنُونَ عَنَّا مِنْ عَذَابِ ٱللَّهِ مِن شَىْءٍ ۚ قَالُوا۟ لَوْ هَدَىٰنَا ٱللَّهُ لَهَدَيْنَٰكُمْ ۖ سَوَآءٌ عَلَيْنَآ أَجَزِعْنَآ أَمْ صَبَرْنَا مَا لَنَا مِن مَّحِيصٍ ﴿٢١﴾ وَقَالَ ٱلشَّيْطَٰنُ لَمَّا قُضِىَ ٱلْأَمْرُ إِنَّ ٱللَّهَ وَعَدَكُمْ وَعْدَ ٱلْحَقِّ وَوَعَدتُّكُمْ فَأَخْلَفْتُكُمْ ۖ وَمَا كَانَ لِىَ عَلَيْكُم مِّن سُلْطَٰنٍ إِلَّآ أَن دَعَوْتُكُمْ فَٱسْتَجَبْتُمْ لِى ۖ فَلَا تَلُومُونِى وَلُومُوٓا۟ أَنفُسَكُم ۖ مَّآ أَنَا۠ بِمُصْرِخِكُمْ وَمَآ أَنتُم بِمُصْرِخِىَّ ۖ إِنِّى كَفَرْتُ بِمَآ أَشْرَكْتُمُونِ مِن قَبْلُ ۗ إِنَّ ٱلظَّٰلِمِينَ لَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿٢٢﴾ وَأُدْخِلَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ جَنَّٰتٍ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَا بِإِذْنِ رَبِّهِمْ ۖ تَحِيَّتُهُمْ فِيهَا سَلَٰمٌ ﴿٢٣﴾ أَلَمْ تَرَ كَيْفَ ضَرَبَ ٱللَّهُ مَثَلًا كَلِمَةً طَيِّبَةً كَشَجَرَةٍ طَيِّبَةٍ أَصْلُهَا ثَابِتٌ وَفَرْعُهَا فِى ٱلسَّمَآءِ ﴿٢٤﴾

(١٩) ئایا نەتبینیوە و نەتزانیوە کە بێگومان خوا ئاسمانەکان و زەوی لەسەر بنچینەی حەق و راستی بەدیهێناوە، ئەگەر بیەوێت ئەوە ئێوە لەناودەبات و ناتانهێڵێت و کەسانی تازە دەهێنێتە کایەوە.

(٢٠) ئەو گۆڕانکاری و ئەو جۆرە شتانە لای خوای بەدەسەلات گران نیە و زۆر ئاسانە.

(٢١) (ئەو رۆژەی کە قیامەت بەرپا دەبێت) هەمووان لەبەردەم دەسەلاتی خوادا دەردەکەون، ئینجا لاوازو بێدەسەلاتەکان (ئەوانەی کوێرانە شوێن ملهوڕو ستەمکاران کەوتبوون) دەڵێن: بەوانەی کە خۆیان بەزل و گەورە دانابوو، بێگومان خۆ ئێمە شوێن ئێوە کەوتبووین! (ئێمە گوێڕایەڵ و فەرمانبەرداری ئێوە بووین!)، جا ئایا ئێوە ئەمڕۆ ناتوانن هەوڵێک بدەن تائەندازەیەک سزای خوا لەسەرمان کەم ببێتەوە، لە وەڵامیاندا وتیان: ئەگەر خوا هیدایەتی ئێمەی بدایە، ئێمەش هیدایەتی ئێوەمان دەدا، (ئەڵبەت روون و ئاشکرایە کەئەوانە بە دەسەلاتدارو بێ دەسەلاتیانەوە لە دنیادا نەک هیدایەتیان نەدەویست بەڵکو دژی دەوەستان و پیلانیان دەگێڕا، ئیتر چۆن خوای گەورە هیدایەتی ئەوجۆرە کەسانە دەدات، خۆ هیدایەت بەزۆر نیە) ئێستەش بۆ ئێمە چوونیەکە، هاوارو ئاهو ناڵە بکەین، یان دان بەخۆدا بگرین، چارمان نیە و رزگار بوونمان ئەستەمە.

(٢٢) (کاتێ هەمووشت تەواودەبێت بەهەشتیەکان دەچنە بەهەشتەوە و دۆزەخیەکان دەخرێنە دۆزەخەوە) شەیتان (بەفەرمانی خوا) دێتە قسەو (روو بە پەیڕەوانی) دەڵێت: بەڕاستی خوا بەڵێنی راست و دروستی پێ راگەیاندبوون منیش بەڵێنی درۆو نادروستم پێدان و جا توانیم گومڕاتان بکەم و لە رێبازی راست وێڵتان بکەم، وەنەبێت من هیچ زۆرو دەسەلاتێکم بەسەر ئێوەدا هەبووبێت، جگە لەوەی (بەوەسوەسەوخەتەرەو خەیاڵ) بانگم کردن (بۆ خوانەناسی و تاوان) ئێوەش بەدەممەوە هاتن و بەقسەتان کردم، ئیتر سەرزەنشت و لۆمەی من مەکەن، بەڵکو سەرزەنشت و لۆمەی خۆتان بکەن (کە ئاوا گێلانە، بێ بیرکردنەوە بەقسەتان کردم، ئەمڕۆ) من ناتوانم بە هاناو هاواری ئێوەوە بێم، ئێوەش ناتوانن بە هاناو هاواری منەوە بێن، بێگومان من باوەڕم نەبوو بەوەی کەکاتی خۆی منتان کردبوو بەشەریک و هاوبەش لە پێشدا، بەڕاستی ئەمڕۆ ستەمکاران سزای زۆر بەئێش دەدرێن.

(٢٣) (لەولاشەوە) ئەوانەی ئیمان و باوەڕیان هێنابوو، کارو کردەوە چاکەکانیان ئەنجام دابوو بەرەو بەهەشت بەرێ کران، چەندەها رووبار بەژێر درەختەکان و بەبەردەم کۆشکەکانیدا دەڕوات، لەوجێگەو رێگە خۆشەدا ژیانی هەمیشەیی و بەردەوام دەبەنە سەر بەفەرمان و رەزامەندی پەروەردگاریان و چاک و چۆنیان لەو بەهەشتەدا ـ سلاوکردنە ـ.

(٢٤) ئایا نەتانبینیوە و نەتانزانیوە چۆن خوا نموونە دەهێنێتەوە بەگوفتاری چاک و پاک، کە وەک درەختی چاک و بەردار وایە، رەگی بەتوندی داکوتاوە لە زەویدا، لق و پۆپەکانیشی بەئاسماندا بلاوبۆتەوە.

تُؤْتِيٓ أُكُلَهَا كُلَّ حِينِۭ بِإِذْنِ رَبِّهَاۗ وَيَضْرِبُ ٱللَّهُ ٱلْأَمْثَالَ لِلنَّاسِ لَعَلَّهُمْ يَتَذَكَّرُونَ ﴿٢٥﴾ وَمَثَلُ كَلِمَةٍ خَبِيثَةٍ كَشَجَرَةٍ خَبِيثَةٍ ٱجْتُثَّتْ مِن فَوْقِ ٱلْأَرْضِ مَا لَهَا مِن قَرَارٍ ﴿٢٦﴾ يُثَبِّتُ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ بِٱلْقَوْلِ ٱلثَّابِتِ فِي ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا وَفِي ٱلْـَٔاخِرَةِۖ وَيُضِلُّ ٱللَّهُ ٱلظَّٰلِمِينَۚ وَيَفْعَلُ ٱللَّهُ مَا يَشَآءُ ﴿٢٧﴾ ۞ أَلَمْ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ بَدَّلُوا۟ نِعْمَتَ ٱللَّهِ كُفْرًا وَأَحَلُّوا۟ قَوْمَهُمْ دَارَ ٱلْبَوَارِ ﴿٢٨﴾ جَهَنَّمَ يَصْلَوْنَهَاۖ وَبِئْسَ ٱلْقَرَارُ ﴿٢٩﴾ وَجَعَلُوا۟ لِلَّهِ أَندَادًا لِّيُضِلُّوا۟ عَن سَبِيلِهِۦۗ قُلْ تَمَتَّعُوا۟ فَإِنَّ مَصِيرَكُمْ إِلَى ٱلنَّارِ ﴿٣٠﴾ قُل لِّعِبَادِيَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ يُقِيمُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ وَيُنفِقُوا۟ مِمَّا رَزَقْنَٰهُمْ سِرًّا وَعَلَانِيَةً مِّن قَبْلِ أَن يَأْتِيَ يَوْمٌ لَّا بَيْعٌ فِيهِ وَلَا خِلَٰلٌ ﴿٣١﴾ ٱللَّهُ ٱلَّذِي خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ وَأَنزَلَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءً فَأَخْرَجَ بِهِۦ مِنَ ٱلثَّمَرَٰتِ رِزْقًا لَّكُمْۖ وَسَخَّرَ لَكُمُ ٱلْفُلْكَ لِتَجْرِيَ فِي ٱلْبَحْرِ بِأَمْرِهِۦۖ وَسَخَّرَ لَكُمُ ٱلْأَنْهَٰرَ ﴿٣٢﴾ وَسَخَّرَ لَكُمُ ٱلشَّمْسَ وَٱلْقَمَرَ دَآئِبَيْنِۖ وَسَخَّرَ لَكُمُ ٱلَّيْلَ وَٱلنَّهَارَ ﴿٣٣﴾



(٢٥) ئەو درەختــە هــەمــوو كــات و دەمێـكـ بـەرو بوومی (پاك و جوان و بێگـەردی) دەبەخشێت بـە ویستی پـەروەردگاری، جا خـوای پـەروەردگار ئـەم نموونانە دەهێنێتەوە بۆ خەڵكی، بـەڵكو یـادئاوەری وەرگـرن (لــە ڕاسـتیدا دیــن و بەرنـامــەی خــوا درەختێکــی ئـاوا پــیرۆزە، ڕەگ و ریشـاڵی خـێر بەخشــە، چونکــە خاکــی زەوی لــە دامــاڵین دەپارێزێت، لق و پۆپی بەسـوودە، سێبەر دەکـات، گەڵاوگوڵی بۆ داوو دەرمان و مـاڵات، بەرو بوومـی بۆ نادەمیزاد، باڵندەکان بـەئاوازی خۆش لەسـەری دەخوێنن و تەسبیحات دەکەن و دڵخۆشمان دەکەن؛ ئۆکسجین دەبەخشێت...هتد).

(٢٦) نموونەی قسەو گوفتاری پیس و ناپوختیش وەکـو درەختـی زرو پیـس و بـێ سـوود وایـە، کـە هەڵکێشـرابێت و لەسـەر ڕووکــاری زەوی فــڕێ درابێـت، بـە هیـچ بـارێکدا خـۆی نــەگرێت (بــۆ سـووتاندن نـەبێت بـۆ هیچی تـر چاك نیـە، ئـەم نموونەیەش ئاماژەیە بۆ هەموو سەرگەردانیەك کە لـە دنیـادا خـێر نەداتـــەوە، لــە قیامەتیشــدا شوێنکەوتوانیان لە دۆزەخەوە سەریان دەردەچێت).

(٢٧) خـوای گــەورە ئەوانــەی باوەڕیـان هێنــاوە پایەدار دەکات لەسەر گوفتاری بـەجێ و دروستیان لە ژیانی دنیادا، لە سەرەمەرگ و لە قیامەتیشـدا، (باوەڕی دامەزراو فریایان دەکـەوێت و) گوفتاریـان ڕێـك و پێـك و دامــەزراو دەبێـت و بـە ئیمانــەوە دەمـرن، لەولاشـەوە هــەر ئـەو خوایـە سـتەمکاران گومڕا دەکات و ئـەوەی پـەروەردگار بیـەوێت هـەر ئەوە پێش دێت و دەکرێت.

(٢٨) ئایا سەرنجی ئەوانە نادەیت کە نازو نیعمەتەکانی خوایان بە حەرام گـێڕاوە (بـۆ گونـاهو خراپـە بـەکاری دەهێنـن) و بوونەتە هۆی سەرگەردانی و تیاچوونی قەومەکەی خۆیان.

(٢٩) (ئەوانە) سەرئەنجام دەچنە ناو دۆزەخ، کە جێگەیەکی زۆر ناخۆشە بۆ نیشتەجێ بوون.

(٣٠) خوانەناسان هاوەڵ و شەریکیان بۆ خوا بڕیاردا، بۆ ئەوەی خەڵك وێڵ بکەن لە بەرنامـەو ئـاین و ڕێبـازی خـوا، پێیـان بڵێ: ڕابوێرن و ژیان بەسەربەرن، چونکە بەڕاستی سەرئەنجامتان بەرەو دۆزەخە.

(٣١) (ئەی محمد ﷺ) بەو بەندانەم کە باوەڕیان هێناوە بڵێ: با نوێژەکانیان بەچاکی ئەنجام بدەن و لەو ڕزق و ڕۆزیەی کـە پێمان بەخشیوون ببەخشن بەنهێنی (بۆ ئەوەی ڕیاو ڕووپامایی تێکەڵ نەبێت) و بەئاشکرا (بۆ هاندانی کـسـانی تـر)، پـێش ئەوەی ڕۆژێك بێت نە کڕینی تیادایە، نە فرۆشتن (تا بەهۆی پارەو سامانەوە خۆتان دەرباز بکەن) نە دۆستایەتیشی تێدایـە (تا دۆستان و هاوەڵان هەوڵێك بدەن).

(٣٢) خوا ئەو زاتەیە کە ئاسمانەکان و زەوی بەدیهێناوە، لە ئاسمانەوە بـارانی بـاراندووە و بەهۆیـەوە بـەروبوومی لـەناخی زەوی بۆ ئێوە دەرهێناوە، هەروەها کەشتی لە دەریادا بۆ ئێوە بار هێناوە تا بەفەرمانی ئەو زاتــە بـڕوات (بەسـەریەوە، هـەر خوایە بەدیهێنەری ئەو مادە سەرەتاییانەی کە کەشتی لێ دروست دەکرێت، هەر ئەو زاتەیە بەدیهێنەری وزەو ئـاوو هـەوا... هتد)، هەروەها ڕووبارەکانیشی بۆ ڕام کردوون (کە جۆرەها سوودیان هەیە بۆتان).

(٣٣) خۆرو مانگیشی بۆ ڕام هێناون کە بەردەوام لە چەرخ و خولدان، شەو و ڕۆژیشی بۆ خزمەتگوزاری ئێوە ڕام هێنا.

وَءَاتَىٰكُم مِّن كُلِّ مَا سَأَلْتُمُوهُ ۚ وَإِن تَعُدُّوا نِعْمَتَ اللَّهِ
لَا تُحْصُوهَا ۗ إِنَّ الْإِنسَانَ لَظَلُومٌ كَفَّارٌ ﴿٣٤﴾ وَإِذْ
قَالَ إِبْرَاهِيمُ رَبِّ اجْعَلْ هَٰذَا الْبَلَدَ ءَامِنًا وَاجْنُبْنِي وَبَنِيَّ
أَن نَّعْبُدَ الْأَصْنَامَ ﴿٣٥﴾ رَبِّ إِنَّهُنَّ أَضْلَلْنَ كَثِيرًا مِّنَ النَّاسِ ۖ
فَمَن تَبِعَنِي فَإِنَّهُ مِنِّي ۖ وَمَنْ عَصَانِي فَإِنَّكَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿٣٦﴾
رَّبَّنَا إِنِّي أَسْكَنتُ مِن ذُرِّيَّتِي بِوَادٍ غَيْرِ ذِي زَرْعٍ عِندَ بَيْتِكَ
الْمُحَرَّمِ رَبَّنَا لِيُقِيمُوا الصَّلَوٰةَ فَاجْعَلْ أَفْئِدَةً مِّنَ النَّاسِ
تَهْوِي إِلَيْهِمْ وَارْزُقْهُم مِّنَ الثَّمَرَاتِ لَعَلَّهُمْ يَشْكُرُونَ ﴿٣٧﴾
رَبَّنَا إِنَّكَ تَعْلَمُ مَا نُخْفِي وَمَا نُعْلِنُ ۗ وَمَا يَخْفَىٰ عَلَى اللَّهِ مِن شَيْءٍ
فِي الْأَرْضِ وَلَا فِي السَّمَاءِ ﴿٣٨﴾ الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِي وَهَبَ لِي
عَلَى الْكِبَرِ إِسْمَاعِيلَ وَإِسْحَاقَ ۚ إِنَّ رَبِّي لَسَمِيعُ الدُّعَاءِ ﴿٣٩﴾
رَبِّ اجْعَلْنِي مُقِيمَ الصَّلَوٰةِ وَمِن ذُرِّيَّتِي ۚ رَبَّنَا وَتَقَبَّلْ
دُعَاءِ ﴿٤٠﴾ رَبَّنَا اغْفِرْ لِي وَلِوَالِدَيَّ وَلِلْمُؤْمِنِينَ يَوْمَ يَقُومُ
الْحِسَابُ ﴿٤١﴾ وَلَا تَحْسَبَنَّ اللَّهَ غَافِلًا عَمَّا يَعْمَلُ
الظَّالِمُونَ ۚ إِنَّمَا يُؤَخِّرُهُمْ لِيَوْمٍ تَشْخَصُ فِيهِ الْأَبْصَارُ ﴿٤٢﴾

(٣٤) لە ھەرچی شتێک داواتان کردبێت و پێویستتان بێت، پێی بەخشیوون، خۆ ئەگەر نازو نیعمەت و بەخششەکانی خوا ژمارە بکەن، ناتوانن بیانژمێرن (بەڵکو یەک نیعمەت ناژمێردرێت، ئەوەندە لق و پۆپی لێ دەبێتەوە)، بەڕاستی زۆربەی ئینسانەکان زۆر ستەمکارو خوانەناس و سپڵەن.

(٣٥) (بەیاد بێنە) کاتێک ئیبراهیم نزای کردو وتی: پەروەردگارا، باڵی ھێمنی و ئاسایش بکێشە بەسەر ئەم شارو ولاتەداو خۆم و نەوەکانیشم بپارێزە لەوەی کە بتەکان بپەرستین.

(٣٦) پەروەردگارا، بەڕاستی ئەو بتانە زۆر کەسیان گومڕا کردو، زۆر خەڵکیان سەرلێشێواو کرد، جا ئەوەی شوێنی من بکەوێت و بەگوێی من بکات، ئەوە بێگومان لە پەیڕەوانی منە، ئەوەش کە لێم یاخی دەبێت، ئەوە بێگومان تۆ زۆر لێخۆش بوو میھرەبانیت.

(٣٧) پەروەردگارا بەڕاستی من ھەندێ لە وەچە و خێزانم لە دۆڵێکی وشکی بێ کشتوکاڵدا جێنشین کردووە؛ لە پاڵ ماڵە پیرۆزەکەتدا، لە پاڵ (بیت الحرام) دا، پەروەردگارا، بۆیە لێرە نیشتەجێم کردن تا بەچاکی نوێژو خواپەرستی ئەنجام بدەن، جا داواکارم دڵی ھەندێک لەو خەڵکە کەمەندکێش بکەیت بۆ لایان و لە رزق و رۆزی جۆراو جۆر بەھرەمەندیان بکەیت، بۆئەوەی سوپاسگوزاری بکەن.

(٣٨) پەروەردگارا، بەڕاستی تۆ دەزانیت چی دەشارینەوە و چی ئاشکرا دەکەین (لە کارو کردەوەمان) و ھیچ شتێک لە زەوی و لە ئاسماندا لە خوای گەورە پەنھان نابێت.

(٣٩) سوپاس و ستایش بۆ ئەو خوایەی کە لە تەمەنی پیریدا ئیسماعیل و ئیسحاقی پێ بەخشیم، بەڕاستی پەروەردگارم بیسەری دوعا و نزایە.

(٤٠) پەروەردگارا، خۆم و نەوەکانم بگێڕە لەو کەسانەی کە ئەنجامدەری نوێژ بین بەچاکی، پەروەردگارا، دوعاو نزام گیرا بکە.

(٤١) پەروەردگارا، لە خۆم و دایک و باوکم و ئیمانداران خۆش ببە، لەو رۆژەدا کە لێپرسینەوە بەرپا دەبێت.

(٤٢) (ئەی پێغەمبەرﷺ، ئەی ئیماندار) واگومان مەبە کە خوا بێ ئاگایە لەو کاروکردەوەیەی ستەمکاران دەیکەن، بەڕاستی خوا سزاکەیان دوا دەخات بۆ رۆژێک کە چاوەکانیان تیایدا ئەبلەق دەبن (جاری وایش ھەیە ھەر لە دنیادا ستەمکاران ریسوا دەکات و تۆڵەیان لێدەسێنێت).

مُهْطِعِينَ مُقْنِعِي رُءُوسِهِمْ لَا يَرْتَدُّ إِلَيْهِمْ طَرْفُهُمْ ۖ وَأَفْئِدَتُهُمْ
هَوَاءٌ ﴿٤٣﴾ وَأَنذِرِ النَّاسَ يَوْمَ يَأْتِيهِمُ الْعَذَابُ فَيَقُولُ الَّذِينَ
ظَلَمُوا رَبَّنَا أَخِّرْنَا إِلَىٰ أَجَلٍ قَرِيبٍ نُّجِبْ دَعْوَتَكَ وَنَتَّبِعِ
الرُّسُلَ ۗ أَوَلَمْ تَكُونُوا أَقْسَمْتُم مِّن قَبْلُ مَا لَكُم
مِّن زَوَالٍ ﴿٤٤﴾ وَسَكَنتُمْ فِي مَسَاكِنِ الَّذِينَ ظَلَمُوا
أَنفُسَهُمْ وَتَبَيَّنَ لَكُمْ كَيْفَ فَعَلْنَا بِهِمْ وَضَرَبْنَا
لَكُمُ الْأَمْثَالَ ﴿٤٥﴾ وَقَدْ مَكَرُوا مَكْرَهُمْ وَعِندَ اللَّهِ
مَكْرُهُمْ وَإِن كَانَ مَكْرُهُمْ لِتَزُولَ مِنْهُ الْجِبَالُ
﴿٤٦﴾ فَلَا تَحْسَبَنَّ اللَّهَ مُخْلِفَ وَعْدِهِ رُسُلَهُ ۗ إِنَّ اللَّهَ عَزِيزٌ
ذُو انتِقَامٍ ﴿٤٧﴾ يَوْمَ تُبَدَّلُ الْأَرْضُ غَيْرَ الْأَرْضِ وَالسَّمَاوَاتُ ۖ
وَبَرَزُوا لِلَّهِ الْوَاحِدِ الْقَهَّارِ ﴿٤٨﴾ وَتَرَى الْمُجْرِمِينَ يَوْمَئِذٍ
مُّقَرَّنِينَ فِي الْأَصْفَادِ ﴿٤٩﴾ سَرَابِيلُهُم مِّن قَطِرَانٍ وَتَغْشَىٰ
وُجُوهَهُمُ النَّارُ ﴿٥٠﴾ لِيَجْزِيَ اللَّهُ كُلَّ نَفْسٍ مَّا كَسَبَتْ ۚ
إِنَّ اللَّهَ سَرِيعُ الْحِسَابِ ﴿٥١﴾ هَٰذَا بَلَاغٌ لِّلنَّاسِ وَلِيُنذَرُوا
بِهِ وَلِيَعْلَمُوا أَنَّمَا هُوَ إِلَٰهٌ وَاحِدٌ وَلِيَذَّكَّرَ أُولُو الْأَلْبَابِ ﴿٥٢﴾

(٤٣) بە پەلە و شپرزەییەوە دێن، سەریان بەرز کردۆتەوە و لە ترس و سامناکی ئەو ڕۆژەدا چاویان ناتروکێت، دڵە راوکێیانەو دڵ و دەروونیان بەتاڵە و هیچ حاڵی نین.

(٤٤) ئەی محمد ﷺ خەڵک بترسێنە و بێداریان بکەرەوە لەو ڕۆژەی کە سزاو ئازار یەخەیان پێ دەگرێت، جا ئەوانەی کە ستەمیان کردووە دەڵێن: پەروەردگارا بۆ ماوەیەکی کەم و نزیک مۆڵەتمان بدە (بمانگێرەوە بۆ دنیا) تا بەدەم بانگەوازەکەتەوە بچین و شوێنی پێغەمبەران بکەوین، (بەڵام تازە کار لە کار ترازاوەو گەڕانەوە نەستەمە، بۆیە پێیان دەوترێت) مەگەر کاتی خۆی سوێندتان نەدەخوارد کە دنیا بەردەوامەو ئێوە تیاچوونتان نابێت؟!

(٤٥) ئێوە کاتی خۆیشی نیشتەجێ بوون لە ماڵ و حاڵ و شوێنی ئەوانەدا کە ستەمیان لە خۆیان کردو (ڕێگەی ئیمان وخواناسیان نەگرت) بۆتان دەرکەوت کە چیمان پێکردن و چیمان بەسەرهێنان و نموونە و باسی زۆرمان بۆ هێناونەتەوە (دەربارەی سەرئەنجامیان).

(٤٦) بێگومان (خوانەناسان) پیلان و تەڵەکەی خۆیانیان گێڕا، فێڵ و فڕی زۆریان کرد، بەڵام هەموو پیلان و فێڵیان لای خوا ئاشکراو دیارە (بەسەر خۆیاندا دەیشکێنێتەوە) هەرچەندە پیلان و فێڵیان کێوەکانیش لە بن بهێنێت.

(٤٧) کەواتە، وا حساب مەکە (ئەی پێغەمبەر ﷺ، ئەی ئیماندار) خوای گەورە بەڵێنی خۆی بۆ پێغەمبەران ناباتە سەر (بەسەرخستن و مانەوەی بەرنامەیان لە دنیاداو سەرفرازی هەمیشەییان لە بەهەشتی بەریندا) چونکە بەڕاستی خوا باڵادەستە و خاوەنی تۆڵەیە (لە ستەمکارو خوانەناسان).

(٤٨) لە ڕۆژێکدا کە ئەم زەویە دەگۆڕێت بە زەویەکی ترو هەروەها ئاسمانەکانیش دەگۆڕێن بە شێوەو شێوازێکی ترو هەموو ئەو خەڵکە دەردەکەون و ئامادەن لە بەردەم دادگای خوای تاک و تەنهاو بەدەسەڵات و خەشمگیر لە کافران.

(٤٩) لەو ڕۆژەدا تاوانباران و گوناهکاران دەبینیت کۆت و زنجیر کراوەتە دەست و پێ وگەردنیان و بەیەکەوە بەستراون.

(٥٠) کراسەکانیان لە قەترانە (کە ماددەیەکی ڕەشی بۆن ناخۆشە و بەخێراییش دەسووتێت) و بڵێسەی ئاگریش ڕووخساریانی داپۆشیوە (زۆر لە سەغڵەتیدان).

(٥١) (ئەم تۆڵەسەندنە لە ستەمکاران) بۆ ئەوەیە کە خوا پاداشتی هەر کەسێک بەگوێرەی ئەوەی کردوویەتی بداتەوە، چونکە بەڕاستی خوای گەورە بەخێرایی لێپرسینەوەکان ئەنجام دەدات.

(٥٢) ئەم (قورئانە) ڕاگەیاندنێکە بۆ خەڵکی بەگشتی تا بەهۆیەوە وریا بکرێنەوە و ئامۆژگاری پێ وەربگرن، بۆ ئەوەی بزانن بێگومان ئەو زاتە خوایەکی تاک و تەنهایە، (هەروەها بۆ ئەوەیە کە) خاوەنی بیرو هۆشەکان یاداوەری وەربگرن و تێبفکرن (لە هەوڵی ئەوەدا بن خۆیشیان و خەڵکیش لە سزای دۆزەخ ڕزگار بکەن).



سورەتی (الحجر)

بەناوی خوای بەخشندە و میهرەبان

(١) سەرنجی سەرەتای سورەتی (البقرة) بدە، ئەو ئایەتانەی لەم سوورەتەدا هاتووە چەند ئایەتێکی ئەو قورئانە روون و ئاشکرایەیە.

(٢) ئەوانەی کە بێ باوەڕ بوون (لە ئایندەیەکی نزیکدا) ئاواتەخواز دەبن کە خۆزگە موسڵمان بوونایە، خۆزگە ئیماندار بوونایە.

(٣) (ئەی محمد ﷺ، ئەی ئیماندار) جارێ وازیان لێ بهێنە با بخۆن و رابوێرن و هیواو ئاواتیان سەر گەرم و بێ ئاگایان بکات، سەرەنجام خۆیان دەبیننەوە (چیان بەسەردێت).

(٤) هیچ شارو شارۆچکەیەکمان وێران نەکردووە کە لەو کاتەدا نامەو کتێبێکی دیاری کراوی نەبووبێت.

(٥) هیچ میللەت و گەلێک پێش کاتی دیاری کراوی لەناوبردنی خۆی ناکەوێت و (هەرگیز) دواش ناکەوێت.

(٦) (خوانەناسان بەگاڵتەوە بە پێغەمبەریان ﷺ) دەوت: ئەی ئەو کەسەی کە قورئانت دابەزێنراوەتە سەر بێگومان تۆ شێتی!!

(٧) ئەوە بۆچی فریشتەت بۆ نەهێناین ئەگەر تۆ لە دەستەی راستگۆیانیت (تا شایەتی لەسەر راستی تۆ بدەن)!

(٨) (خوای گەورەش بۆ بەرپەرچدانەوەیان دەفەرموێت) ئێمە فریشتە دانابەزێنین تەنها بۆ چەسپاندنی حەق و پشتگیری راستی نەبێت، ئەو کاتەش (کە دابەزین، خوانەناسان) مۆڵەت نادرێن و (لەناو دەبرێن).

(٩) بەڕاستی هەر ئێمە قورئانمان دابەزاندووە و بێگومان هەر ئێمەش پارێزگاری دەکەین و (نایەڵین دەستی خیانەتکار هیچ جۆرە دەستێکی تێ بخات و هەموو هەوڵێک بۆ دەستکاری کردنی نەزۆکە).

(١٠) سوێند بەخوا بەڕاستی ئێمە پێغەمبەرانمان پێش تۆ رەوانە کردووە، بۆ سەر گەل و هۆزو میللەتانی پێشوو.

(١١) خوانەناسان هیچ پێغەمبەرێکیان بۆ نەهاتووە کە گاڵتەیان پێ نەکردبێت.

(١٢) ئا بەو شێوەیە ئێمە قورئان دەدەین بەگوێ و دڵی تاوانباران و تاوانکاراندا (تا بەڵگە بێت لەسەریان).

(١٣) لەکاتێکدا باوەڕی پێ ناهێنن و هەر لەسەر بەرنامەی پێشینان دەڕۆن.

(١٤) (ئەو بێ باوەڕانە) ئەگەر دەروازەیەکمان لە ئاسمانەوە بۆ بکەردنایەتەوە تا پیادا سەربکەون و تێپەڕبن و (نهێنی دروستکراوانی ئێمە ببینن، هەرباوەڕ ناهێنن)...

(١٥) ئەوە دەیانوت: بێگومان چاوبەستمان لێکراوە، یاخود ئێمە کەسانێکی جادوو لێکراوین!!

وَلَقَدۡ جَعَلۡنَا فِي ٱلسَّمَآءِ بُرُوجٗا وَزَيَّنَّٰهَا لِلنَّٰظِرِينَ ﴿١٦﴾ وَحَفِظۡنَٰهَا مِن كُلِّ شَيۡطَٰنٖ رَّجِيمٍ ﴿١٧﴾ إِلَّا مَنِ ٱسۡتَرَقَ ٱلسَّمۡعَ فَأَتۡبَعَهُۥ شِهَابٞ مُّبِينٞ ﴿١٨﴾ وَٱلۡأَرۡضَ مَدَدۡنَٰهَا وَأَلۡقَيۡنَا فِيهَا رَوَٰسِيَ وَأَنۢبَتۡنَا فِيهَا مِن كُلِّ شَيۡءٖ مَّوۡزُونٖ ﴿١٩﴾ وَجَعَلۡنَا لَكُمۡ فِيهَا مَعَٰيِشَ وَمَن لَّسۡتُمۡ لَهُۥ بِرَٰزِقِينَ ﴿٢٠﴾ وَإِن مِّن شَيۡءٍ إِلَّا عِندَنَا خَزَآئِنُهُۥ وَمَا نُنَزِّلُهُۥٓ إِلَّا بِقَدَرٖ مَّعۡلُومٖ ﴿٢١﴾ وَأَرۡسَلۡنَا ٱلرِّيَٰحَ لَوَٰقِحَ فَأَنزَلۡنَا مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءٗ فَأَسۡقَيۡنَٰكُمُوهُ وَمَآ أَنتُمۡ لَهُۥ بِخَٰزِنِينَ ﴿٢٢﴾ وَإِنَّا لَنَحۡنُ نُحۡيِۦ وَنُمِيتُ وَنَحۡنُ ٱلۡوَٰرِثُونَ ﴿٢٣﴾ وَلَقَدۡ عَلِمۡنَا ٱلۡمُسۡتَقۡدِمِينَ مِنكُمۡ وَلَقَدۡ عَلِمۡنَا ٱلۡمُسۡتَـٔۡخِرِينَ ﴿٢٤﴾ وَإِنَّ رَبَّكَ هُوَ يَحۡشُرُهُمۡۚ إِنَّهُۥ حَكِيمٌ عَلِيمٞ ﴿٢٥﴾ وَلَقَدۡ خَلَقۡنَا ٱلۡإِنسَٰنَ مِن صَلۡصَٰلٖ مِّنۡ حَمَإٖ مَّسۡنُونٖ ﴿٢٦﴾ وَٱلۡجَآنَّ خَلَقۡنَٰهُ مِن قَبۡلُ مِن نَّارِ ٱلسَّمُومِ ﴿٢٧﴾ وَإِذۡ قَالَ رَبُّكَ لِلۡمَلَٰٓئِكَةِ إِنِّي خَٰلِقُۢ بَشَرٗا مِّن صَلۡصَٰلٖ مِّنۡ حَمَإٖ مَّسۡنُونٖ ﴿٢٨﴾ فَإِذَا سَوَّيۡتُهُۥ وَنَفَخۡتُ فِيهِ مِن رُّوحِي فَقَعُواْ لَهُۥ سَٰجِدِينَ ﴿٢٩﴾ فَسَجَدَ ٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ كُلُّهُمۡ أَجۡمَعُونَ ﴿٣٠﴾ إِلَّآ إِبۡلِيسَ أَبَىٰٓ أَن يَكُونَ مَعَ ٱلسَّٰجِدِينَ ﴿٣١﴾

(١٦) سوێند بەخوا بەڕاستی ئێمە لە ئاسماندا چەند خولگەیەکی گەورەمان بەدی هێناوە بۆ ئەستێرەکان و ڕازاندوومانەتەوە بۆ ئەوانەی کە بەوردی تەماشای دەکەن (تا گەورەیی دەسەڵاتی پەروەردگاریان بۆ دەربکەوێت).

(١٧) هەروەها پاراستوومانە لە (پیلان و دەست درێژی) هەموو شەیتانێکی ڕەجم کراو و نەفرین لێکراو.

(١٨) مەگەر شەیتانێک بەرز ببێتەوە و بە هەواڵێک بزانێت و بیدزێت، ئەوسا خێرا پارچە ئاگرێکی ئاشکرای بۆ دەکشێت و تەفر و تونای دەکات.

(١٩) زەویشمان ڕاخستووە، چیاو کێوەکانمان لەسەر داناوە، لە هەموو جۆرە ڕووەک و بەروبوومێکمان تیایدا ڕواندووە بەشێوەیەکی ڕێک و پێک و بەئەندازەی پێویست و دیاری کراو.

(٢٠) لەسەر زەویشدا بژێوی ڕۆژانەمان بۆ ئێوە دابین کردووە، هەروەها بۆ ئەوانەش کە ئێوە ناتوانن ڕۆزیان بۆ دابین بکەن.

(٢١) هیچ شتێک نییە (لە بەهرەو نازو نیعمەتەکان) کە گەنجینەکانی لای ئێمە نەبێت و ئێمە نایبەخشین بەئەندازەی دیاریکراو لەکاتی لەباردا نەبێت.

(٢٢) (یەکێک لە بەخششەکانی خوا ئەوەیە) ئێمە شنەبامان ناردووە کە پیتێنەری ڕووەک و دارو درەختە، هەروەها بارانمان لە ئاسمانەوە باراندووە و ئێوەی پێ تێراو دەکەین (سەرەڕای کشتوکاڵ و زیندەوەران) بێ ئەوەی ئێوە ئەو ئاوانەتان زەخیرە کردبێت (ئێمە لە ژێر زەویدا بۆمان دابین کردوون، بەهۆی کانی، یاخود بیرەوە دەستتان دەکەوێت).

(٢٣) بەڕاستی هەر ئێمە ژیان دەبەخشین و مردنیش پێش دەهێنین، سەرئەنجام هەر ئێمەش خاوەنی هەموو جیهانین.

(٢٤) سوێند بەخوا بێگومان ئێمە ئاگادارین لە پێشینانی ئێوە، هەروەها ئاگادارین لە نەوەکانی داهاتوویش.

(٢٥) بەڕاستی پەروەردگاری تۆ هەر خۆی هەمووان کۆ دەکاتەوە و بێگومان هەر ئەو زاتە داناو زانایە.

(٢٦) سوێند بەخوا ئێمە سەرەتا ئینسانمان لە قوڕێکی وشک دروست کرد کە پێشتر قوڕێکی ڕەشباو و ترشاو بوو.

(٢٧) پەریشمان پێشتر لە ئاگرێکی بەتین دروست کرد کە بەوردیلە کونەکاندا تێدەپەڕێت.

(٢٨) یادی ئەوە بکەرەوە کاتێک پەروەردگارت بەفریشتەکانی وت: بەڕاستی من دروستکاری بەشەرێکم لە قوڕێکی وشک کە پێشتر قوڕێکی ڕەشباو و ترشاو بوو.

(٢٩) جا کاتێک ڕێک و پێک و تەواوم کرد، لەو ڕۆحە تایبەتیەی کە من (بەدیهێنەری ئەوم)، پێمبەخشی، ئەوە هەمووتان کڕنووشی بۆ بەرن (کڕنووشی ڕێزو بەفەرمانی خوا).

(٣٠) ئینجا فریشتەکان (فەرمانی پەروەردگاریان بەجێ هێناو) هەموویان بەگشتی کڕنووشی ڕێزیان برد.

(٣١) جگە لە ئیبلیس (شەیتانی گەورە) سەرپێچی کرد کە لەگەڵ کڕنووش بەراندا بێت.

قَالَ يَٰٓإِبۡلِيسُ مَا لَكَ أَلَّا تَكُونَ مَعَ ٱلسَّٰجِدِينَ ﴿٣٢﴾ قَالَ لَمۡ أَكُن لِّأَسۡجُدَ لِبَشَرٍ خَلَقۡتَهُۥ مِن صَلۡصَٰلٍ مِّنۡ حَمَإٍ مَّسۡنُونٍ ﴿٣٣﴾ قَالَ فَٱخۡرُجۡ مِنۡهَا فَإِنَّكَ رَجِيمٌ ﴿٣٤﴾ وَإِنَّ عَلَيۡكَ ٱللَّعۡنَةَ إِلَىٰ يَوۡمِ ٱلدِّينِ ﴿٣٥﴾ قَالَ رَبِّ فَأَنظِرۡنِيٓ إِلَىٰ يَوۡمِ يُبۡعَثُونَ ﴿٣٦﴾ قَالَ فَإِنَّكَ مِنَ ٱلۡمُنظَرِينَ ﴿٣٧﴾ إِلَىٰ يَوۡمِ ٱلۡوَقۡتِ ٱلۡمَعۡلُومِ ﴿٣٨﴾ قَالَ رَبِّ بِمَآ أَغۡوَيۡتَنِي لَأُزَيِّنَنَّ لَهُمۡ فِي ٱلۡأَرۡضِ وَلَأُغۡوِيَنَّهُمۡ أَجۡمَعِينَ ﴿٣٩﴾ إِلَّا عِبَادَكَ مِنۡهُمُ ٱلۡمُخۡلَصِينَ ﴿٤٠﴾ قَالَ هَٰذَا صِرَٰطٌ عَلَيَّ مُسۡتَقِيمٌ ﴿٤١﴾ إِنَّ عِبَادِي لَيۡسَ لَكَ عَلَيۡهِمۡ سُلۡطَٰنٌ إِلَّا مَنِ ٱتَّبَعَكَ مِنَ ٱلۡغَاوِينَ ﴿٤٢﴾ وَإِنَّ جَهَنَّمَ لَمَوۡعِدُهُمۡ أَجۡمَعِينَ ﴿٤٣﴾ لَهَا سَبۡعَةُ أَبۡوَٰبٖ لِّكُلِّ بَابٖ مِّنۡهُمۡ جُزۡءٞ مَّقۡسُومٌ ﴿٤٤﴾ إِنَّ ٱلۡمُتَّقِينَ فِي جَنَّٰتٖ وَعُيُونٍ ﴿٤٥﴾ ٱدۡخُلُوهَا بِسَلَٰمٍ ءَامِنِينَ ﴿٤٦﴾ وَنَزَعۡنَا مَا فِي صُدُورِهِم مِّنۡ غِلٍّ إِخۡوَٰنًا عَلَىٰ سُرُرٖ مُّتَقَٰبِلِينَ ﴿٤٧﴾ لَا يَمَسُّهُمۡ فِيهَا نَصَبٞ وَمَا هُم مِّنۡهَا بِمُخۡرَجِينَ ﴿٤٨﴾ ۞ نَبِّئۡ عِبَادِيٓ أَنِّيٓ أَنَا ٱلۡغَفُورُ ٱلرَّحِيمُ ﴿٤٩﴾ وَأَنَّ عَذَابِي هُوَ ٱلۡعَذَابُ ٱلۡأَلِيمُ ﴿٥٠﴾ وَنَبِّئۡهُمۡ عَن ضَيۡفِ إِبۡرَٰهِيمَ ﴿٥١﴾



(٣٢) ئەوسا خوا فەرمووی: ئەی ئیبلیس ئـەوە بـۆ لەگەڵ کڕنووش بەراندا نیت؟!

(٣٣) شەیتان لە وەڵامدا وتی: من ئەوەندە (نزم و بچوک) نەبووم کڕنووش بەرم بـۆ بەشـەرێک کـە تـۆ دروستت کـردووە لـە قوڕێکی وشـک کـە پێشتـر قوڕێکی ڕەشباو و ترشاو بووە؟!

(٣٤) خوا فـەرمووی : (چونکـە لـە فـەرمانی مـن سەرپێچیت کرد، دەبێت لەم شـوێنە نـەمێنیت، کە بەهەشتە یان ئاسمان) کەواتە دەرچـۆ لـێرە چونکـە بەڕاستی تۆ نەفرین لێکراویت.

(٣٥) بەڕاستی نـەفرینی خـوات بـەردەوام لەسـەرە هەتا ڕۆژی دوایی.

(٣٦) شەیتان وتی: پەروەردگارا، مۆڵەتم بدە هـەتا ئەو ڕۆژەی هەمووان زیندوو دەکرێنەوە.

(٣٧) تاڕۆژی کاتە دیاریکراو زانراوەکە (لای خوا).

(٣٩) ئیبلیس (بەبوغزو کینەو حەسادەتەوە) وتی: پەروەردگارم، مـادەم بـەهۆی ئـەم ئینسـانەوە منت سەر لێشێواو کرد، شەرت بێت لـە زەویـدا هـەموو گوناهو لادان و تاوانێکیان لاجوان و شیرین بکـەم و هەر هەموویان سەر لێشێواو و سەرگەردان بکەم.

(٤٠) بێجگە لە بەندە پوختە و دڵسۆزەکانی خـۆت نەبێت (چونکە دڵـیان بـە بـاوەڕ بـە تـۆو یـادی تـۆ ئاوەدانـە، هـەوڵ و کۆششی مـن بـۆ وێـڵ کردنیـان ناکامە).

(٤١) خـوای گـەورە فـەرمووی: ئـا ئـەوە ڕێگـەو ڕێبازێکی ڕاست و دروستە هەر بۆ لای مـن دێـت و هەر من چاودێری دەکەم.

(٤٢) بەڕاستی بەندە چاک و پاکەکانی من بە تۆ فریو نادرێن و تۆ هیچ دەسـەڵاتێکت نیـە بەسـەریاندا، جگـە لەوانـەی کـە شوێنت کەوتوون لە سەرکەش و یاخی و سەرگەردانەکان.

(٤٣) بێگومان دۆزەخیش بەڵێنگای هەر هەموو ئەوانە بەگشتی.

(٤٤) حەوت دەروازەی گەورەی هەیە، هەر دەروازەیەکیشی چەند دەرگاو چەند بەشێکە کە دەستەی دۆزەخیـان، بـەگوێرەی تاوان و گوناهیان ڕاپێچ دەکرێن بۆ ناوی.

(٤٥) (لەولاشەوە) بەڕاستی خواناس و پارێزکاران لەناو باخەکانی بەهەشت و کانیاوە سازگارەکاندان.

(٤٦) پێیان دەوترێت: فەرموون بچنە ناوی بەسەلامەتی و سەلامەتان لەسەر بێت، ژیانی پڕ لە ئاسوودەیی تیادا بەرنە سەر.

(٤٧) لە کـاتێکدا هەرچی کینەو بوغـزە لـە دڵ و دەروونیـاندا دەرمـان کێشـاو ئـەو بەختەوەرانـە بـرای یـەکترن و لـەسەر کورسی و قەنەفە ڕازاوەکان لە بەرامبەر یەکەوە دانیشـتون (لـە بەیەکگەیشـتنەوەیەکی پڕسـۆزو خۆشەویستیدا، تەماشـای یەکتردەکەن و سەلام لە یەکتر دەکەن و سوپاس و ستایشی پەروەردگار دەکەن).

(٤٨) هیچ جۆرە بێ تاقەتی و بێزاری و ناخۆشی و پەستیەک دووچاریان نابێت و هیچ کات ئەوان لەو بەهەشتە دەرناکرێن.

(٤٩) ئەی پێغەمبەر ﷺ هەواڵ بدە بە بەندەکانم کە هەر من بەڕاستی لێبووردەی میهرەبانم (بۆ باوەڕداران).

(٥٠) بێگومان هەر سزاو تۆڵەی منیش، سزاو ئازارێکی زۆر بەئێشە (ئامادەم کردووە بۆ بێباوەڕو سەرکەش و یاخیەکان).

(٥١) هەروەها هەواڵیان بدەرێ دەربارەی میوانەکانی ئیبراهیم علیه السلام

إِذْ دَخَلُوا عَلَيْهِ فَقَالُوا سَلَٰمًا قَالَ إِنَّا مِنكُمْ وَجِلُونَ ﴿٥٢﴾ قَالُوا لَا تَوْجَلْ إِنَّا نُبَشِّرُكَ بِغُلَٰمٍ عَلِيمٍ ﴿٥٣﴾ قَالَ أَبَشَّرْتُمُونِي عَلَىٰٓ أَن مَّسَّنِيَ الْكِبَرُ فَبِمَ تُبَشِّرُونَ ﴿٥٤﴾ قَالُوا بَشَّرْنَٰكَ بِالْحَقِّ فَلَا تَكُن مِّنَ الْقَٰنِطِينَ ﴿٥٥﴾ قَالَ وَمَن يَقْنَطُ مِن رَّحْمَةِ رَبِّهِۦٓ إِلَّا الضَّآلُّونَ ﴿٥٦﴾ قَالَ فَمَا خَطْبُكُمْ أَيُّهَا الْمُرْسَلُونَ ﴿٥٧﴾ قَالُوٓا إِنَّآ أُرْسِلْنَآ إِلَىٰ قَوْمٍ مُّجْرِمِينَ ﴿٥٨﴾ إِلَّآ ءَالَ لُوطٍ إِنَّا لَمُنَجُّوهُمْ أَجْمَعِينَ ﴿٥٩﴾ إِلَّا امْرَأَتَهُۥ قَدَّرْنَآ إِنَّهَا لَمِنَ الْغَٰبِرِينَ ﴿٦٠﴾ فَلَمَّا جَآءَ ءَالَ لُوطٍ الْمُرْسَلُونَ ﴿٦١﴾ قَالَ إِنَّكُمْ قَوْمٌ مُّنكَرُونَ ﴿٦٢﴾ قَالُوا بَلْ جِئْنَٰكَ بِمَا كَانُوا فِيهِ يَمْتَرُونَ ﴿٦٣﴾ وَأَتَيْنَٰكَ بِالْحَقِّ وَإِنَّا لَصَٰدِقُونَ ﴿٦٤﴾ فَأَسْرِ بِأَهْلِكَ بِقِطْعٍ مِّنَ الَّيْلِ وَاتَّبِعْ أَدْبَٰرَهُمْ وَلَا يَلْتَفِتْ مِنكُمْ أَحَدٌ وَامْضُوا حَيْثُ تُؤْمَرُونَ ﴿٦٥﴾ وَقَضَيْنَآ إِلَيْهِ ذَٰلِكَ الْأَمْرَ أَنَّ دَابِرَ هَٰٓؤُلَآءِ مَقْطُوعٌ مُّصْبِحِينَ ﴿٦٦﴾ وَجَآءَ أَهْلُ الْمَدِينَةِ يَسْتَبْشِرُونَ ﴿٦٧﴾ قَالَ إِنَّ هَٰٓؤُلَآءِ ضَيْفِي فَلَا تَفْضَحُونِ ﴿٦٨﴾ وَاتَّقُوا اللَّهَ وَلَا تُخْزُونِ ﴿٦٩﴾ قَالُوٓا أَوَلَمْ نَنْهَكَ عَنِ الْعَٰلَمِينَ ﴿٧٠﴾

(٥٢) کاتێک کتوپڕ خۆیان کرد بە ماڵداو وتیان: سڵاو (ئیبراهیم دوای وەڵامدانەوەی سڵاوەکەیان) وتی:(ئێوە کێن؟) بەڕاستی ئێمە لێتان دەترسین!!.

(٥٣) فریشتەکان وتیان: مەترسە (ئێمە لەلایەن خواوە رەوانە کراوین) و بێگومان ئێمە مژدەی (لە دایک بوونی) کوڕێکی زۆر زانات پێ دەدەین.

(٥٤) ئیبراهیم وتی : ئایا مژدەم دەدەنێ لە کاتێکدا کە ئاوا پیری یەخەی پێگرتووم!.. جا بەچی مژدەی دەدەنێ؟!

(٥٥) فریشتەکان وتیان: بەراستی مژدەت دەدەینێ، کەواتە نەکەیت لەو کەسانە بیت کە نائومێدن (لە بەخششەکانی خوا).

(٥٦) ئیبراهیم وتی: ئایا کێ نائومێد دەبێت لە رەحمەت و بەخششەکانی پەروەردگاری، مەگەر کەسانێک کە گومڕاو سەرگەردانن.

(٥٧) (ئینجا دوای ئەوەی دڵنیابوو لێیان) وتی: ئەی فریشتە نێرراوەکان چ کارێکی گرنگتان بە دەستەوەیە؟! (جگە لەم مژدەیە)

(٥٨) فریشتەکان وتیان: بەراستی ئێمە نێردراوین بۆ سەر قەوم و هۆزێکی زۆر تاوانبار.

(٥٩) بەڵام خانەوادەی لوط هەموویان رزگار دەکەین.

(٦٠) جگە هاوسەرەکەی، بەراستی بڕیارماندا وە ئەویش لە ریزی تیاچووەکاندا بمێنێتەوە چونکە بێباوەڕە.

(٦١) ئینجا (دوای ئەوەی ئیبراهیمیان بەجێ هێشت، فریشتەکان بەرەو شارەکەی لوط ڕۆیشتن) کاتێک ئەو فرستادانە هاتنە ناو خانەوادەی لوط...

(٦٢) پێی وتن: (داوای لێبوردن دەکەین، جەنابتان کێن؟) بەراستی ئێوە کەسانێکی نەناسراون ...

(٦٣) دوای ئەوەی فریشتەکان خۆیان پێناساند وتیان: دڵت هیچ نەکات بەڵکو ئێمە هاتووین بۆ لای تۆ بۆ ئەوەی ئەو هەڕەشانەی تۆ دەتکردو ئەو بێ رەوشتانە گومانیان لێدەکرد، بیهێنینە دی...

(٦٤) ئەمڕۆ ئیتر بۆ بەرپاکردنی ئەو راستیە هاتووین و بێگومان راستیش دەڵێین...

(٦٥) بەشێکی شەو بمێنێت خۆت و خانەوادەت دەرچن و تۆ دوایان بکەوە، با هیچ کامتان ئاوڕ نەداتەوە، بڕۆن بەرەو ئەو شوێنەی کە فەرمانتان پێ دەدرێت.

(٦٦) ئێمە نیگامان نارد بۆلای ـ لوط ـ و بڕیارماندا کە بەراستی لەکاتی بەرەبەیاندا دوای ئەوانە براوە و دەیاریان نەماوە.

(٦٧) ئەوسا خەڵکی ناپوخت و بێ رەوشتی ئەو شارە (زانیان بە میوانە بەڕێزەکان) هاتن (بەگرمەو گاڵەوە و) مژدەی ناپوختیان بەیەکتری دەدا!

(٦٨) لوط وتی: بەراستی ئەوانە میوانی منن و حەیای من مەبەن، شەرمەزارم مەکەن و نابرووم مەبەن.

(٦٩) لە خوا بترسن و ریسوام مەکەن (لە شەرواڵ پیسی کۆڵ بدەن).

(٧٠) (شەرواڵ پیس و ناپوختەکان) وتیان: ئایا رێگری ئەوەمان لێ نەکردیت کە حەقی کەست نەبێت و بەرگری لە کەس نەکەیت!

قَالَ هَٰٓؤُلَآءِ بَنَاتِيٓ إِن كُنتُمۡ فَٰعِلِينَ (٧١) لَعَمۡرُكَ إِنَّهُمۡ لَفِي سَكۡرَتِهِمۡ يَعۡمَهُونَ (٧٢) فَأَخَذَتۡهُمُ ٱلصَّيۡحَةُ مُشۡرِقِينَ (٧٣) فَجَعَلۡنَا عَٰلِيَهَا سَافِلَهَا وَأَمۡطَرۡنَا عَلَيۡهِمۡ حِجَارَةٗ مِّن سِجِّيلٍ (٧٤) إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَٰتٖ لِّلۡمُتَوَسِّمِينَ (٧٥) وَإِنَّهَا لَبِسَبِيلٖ مُّقِيمٍ (٧٦) إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَةٗ لِّلۡمُؤۡمِنِينَ (٧٧) وَإِن كَانَ أَصۡحَٰبُ ٱلۡأَيۡكَةِ لَظَٰلِمِينَ (٧٨) فَٱنتَقَمۡنَا مِنۡهُمۡ وَإِنَّهُمَا لَبِإِمَامٖ مُّبِينٖ (٧٩) وَلَقَدۡ كَذَّبَ أَصۡحَٰبُ ٱلۡحِجۡرِ ٱلۡمُرۡسَلِينَ (٨٠) وَءَاتَيۡنَٰهُمۡ ءَايَٰتِنَا فَكَانُواْ عَنۡهَا مُعۡرِضِينَ (٨١) وَكَانُواْ يَنۡحِتُونَ مِنَ ٱلۡجِبَالِ بُيُوتًا ءَامِنِينَ (٨٢) فَأَخَذَتۡهُمُ ٱلصَّيۡحَةُ مُصۡبِحِينَ (٨٣) فَمَآ أَغۡنَىٰ عَنۡهُم مَّا كَانُواْ يَكۡسِبُونَ (٨٤) وَمَا خَلَقۡنَا ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَ وَمَا بَيۡنَهُمَآ إِلَّا بِٱلۡحَقِّۗ وَإِنَّ ٱلسَّاعَةَ لَأٓتِيَةٞۖ فَٱصۡفَحِ ٱلصَّفۡحَ ٱلۡجَمِيلَ (٨٥) إِنَّ رَبَّكَ هُوَ ٱلۡخَلَّٰقُ ٱلۡعَلِيمُ (٨٦) وَلَقَدۡ ءَاتَيۡنَٰكَ سَبۡعٗا مِّنَ ٱلۡمَثَانِي وَٱلۡقُرۡءَانَ ٱلۡعَظِيمَ (٨٧) لَا تَمُدَّنَّ عَيۡنَيۡكَ إِلَىٰ مَا مَتَّعۡنَا بِهِۦٓ أَزۡوَٰجٗا مِّنۡهُمۡ وَلَا تَحۡزَنۡ عَلَيۡهِمۡ وَٱخۡفِضۡ جَنَاحَكَ لِلۡمُؤۡمِنِينَ (٨٨) وَقُلۡ إِنِّيٓ أَنَا ٱلنَّذِيرُ ٱلۡمُبِينُ (٨٩) كَمَآ أَنزَلۡنَا عَلَى ٱلۡمُقۡتَسِمِينَ (٩٠)

(٧١) لوط وتی: ئا ئەوانـە (ئافرەتـانی شار) هـەموو وەک کچی منن (ئەگەر دەتانەوێت ئەوانەتان لێ مـارە دەکەم، تا ئارەزووی خۆتان لەرێگەی دروستی خۆیـەوە ئەنجام بدەن) ئەگەر ئامادەن.

(٧٢) (ئەی محمد ﷺ) سوێند بەگیانی تۆ ئەوانـە لـە سەرخۆشی خۆیاندا بۆگوناهـ لەسەرگەردانیدا دەتلێنەوە.

(٧٣) جا هـەر لـە بەرەبـەیاندا دەنگە سـامناکەکە و بوومەلەرزەیەک یەخەی پێگرتن.

(٧٤) ئینجـا شارەکـەمـان ژێـرەو ژوور کـردو بـە سەنگگڵ بەرد بارانمان کردن.

(٧٥) بێگومان ئا لەو بەسـەرهاتەدا بەڵگـەو نیشـانەی زۆر هەیە بۆ کەسانێک کە پەند و ئامۆژگاری وەرگرن.

(٧٦) بێگومـان ئـەو شارە وێرانـە دەکەوێتـە سـەرە رێیەکی بەردەوامی کاروانچیانـەوە (نیشـانەی خەشم و قینی خوایە لە بێ ڕەوشتان، تا خەڵکی تێفکرن).

(٧٧) بەڕاستی لەو بەسەرهاتەدا بەڵگە و نیشـانەیەکی روون و ئاشکرا دەردەکەوێت بـۆ ئیمانداران (کـە هـێزو دەسەڵاتی پەروەردگاریان بێ سنوورە و لەکاتی لـەباردا دەیخاتە کارو شارو دێهاتی خوانەناسان و بێ ڕەوشـتان کاول دەکات).

(٧٨) دانیشتوانی باخچە و باخ و باخاتەکانیش (وەکـو و قەومی لوط) ستەمکار بوون.

(٧٩) ئێمـە تۆڵـەمان لـەوانیش سـەند، هــەردوو شوێنەوارەکە بەئاشکرا دیارن (چیمان بەسەر هێناون).

(٨٠) سوێند بەخوا دانیشتوانی (حجر) یش بڕوایان بە بەرنامەی پێغەمبەران نەکرد (حجر: شوێنێکە لە نێوان تەبووک و مەدینەدا، قەومی ثەمود، تیایدا ژیاوە).

(٨١) ئێمە نیشانەو بەڵگەکانی خۆمانمان پێبەخشـین کەچی ئەوان گوێیان پێنەداو پشتیان تێکرد.

(٨٢) ئەوانە لە چیاکاندا خانووبەرەیان دەتاشی و، بەئاسوودەییەوە ژیانیان تێدا دەبردە سەر.

(٨٣) ئینجا ئەوانیش دەنگێکی سامناک و بوومەلەرزەیەکی سەخت یەخەی پێگرتن لە بەرەبەیاندا.

(٨٤) ئەو کارو کردەوەی کە دەیانکرد فریایان نەکەوت و (لە تۆڵەی خوایی نەیپاراستن).

(٨٥) ئێمە ئاسمانەکان و زەوی و هەرچی لە نێوانیاندایە دروستمان نەکردووە، بۆ مەبەستی چەسپاندنی حەق و ڕاستی نـەبێت (هیـچ شتێک لە دروست کراوان بێمەبەست نیە، هیچ شتێک بێ ئامانج نیە..)، بەڕاستی ڕۆژی قیامەتیش بەرێوەیە و هەر دێت و تۆ (ئەی پێغەمبەر، ئەی ئیماندار) بەشێوازێکی جوان چاوپۆشی بکە و لێبووردە بە (لە ڕەفتاری نادروستی نەفامان).

(٨٦) بەڕاستی پەروەردگاری تۆ هەر خۆی بەدیهێنەرێکی شارەزاو زاناو لێزانە.

(٨٧) سوێند بێت ئەی پێغەمبەرﷺ ئێمە حەوت ئایەتمان پێداویت (کە بریتییە لە سـوورەتی فاتحـە) هـەروەها قورئـانی گـەورە و مەزنیشمان پێ بەخشیوویت.

(٨٨) جا تۆ نەکەیت چاوەکانت ببڕیتە ئەو کەسانەی کە لە هەندێک نازو نیعمەتی دنیا بەهرەوەرمان کردوون، خەفـەت مـەخۆ لێیـان (کاتێک دەبینیت شوێنی حەق ناکەون)، باڵی بەزەیی ئەوی بکە بۆ ئیمانداران (واتە خۆشت بوێن و بەسۆز بە بۆیان).

(٨٩) بڵێ: بەڕاستی من بێدارخەرەوەیەکی ئاشکراو دیارم (ئەگەر سەرکەشی بکەن سەرئەنجامی سامناک چاوەڕێتانە).

(٩٠) هەروەک کتێبی ئاسمانیمان دابەزاندە سەر بەش بەشکەران (کە مەبەست جولەکەو گاورە، باوەڕ بەهەندێکی دەکەن و پەیڕەوی هەندێکی ناکەن، یاخود بەشێکی زۆریان دەستکاری کردووە).

ٱلَّذِينَ جَعَلُوا۟ ٱلْقُرْءَانَ عِضِينَ ﴿٩١﴾ فَوَرَبِّكَ لَنَسْـَٔلَنَّهُمْ أَجْمَعِينَ ﴿٩٢﴾ عَمَّا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴿٩٣﴾ فَٱصْدَعْ بِمَا تُؤْمَرُ وَأَعْرِضْ عَنِ ٱلْمُشْرِكِينَ ﴿٩٤﴾ إِنَّا كَفَيْنَٰكَ ٱلْمُسْتَهْزِءِينَ ﴿٩٥﴾ ٱلَّذِينَ يَجْعَلُونَ مَعَ ٱللَّهِ إِلَٰهًا ءَاخَرَ فَسَوْفَ يَعْلَمُونَ ﴿٩٦﴾ وَلَقَدْ نَعْلَمُ أَنَّكَ يَضِيقُ صَدْرُكَ بِمَا يَقُولُونَ ﴿٩٧﴾ فَسَبِّحْ بِحَمْدِ رَبِّكَ وَكُن مِّنَ ٱلسَّٰجِدِينَ ﴿٩٨﴾ وَٱعْبُدْ رَبَّكَ حَتَّىٰ يَأْتِيَكَ ٱلْيَقِينُ ﴿٩٩﴾

سُورَةُ النَّحْلِ

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

أَتَىٰٓ أَمْرُ ٱللَّهِ فَلَا تَسْتَعْجِلُوهُ ۚ سُبْحَٰنَهُۥ وَتَعَٰلَىٰ عَمَّا يُشْرِكُونَ ﴿١﴾ يُنَزِّلُ ٱلْمَلَٰٓئِكَةَ بِٱلرُّوحِ مِنْ أَمْرِهِۦ عَلَىٰ مَن يَشَآءُ مِنْ عِبَادِهِۦٓ أَنْ أَنذِرُوٓا۟ أَنَّهُۥ لَآ إِلَٰهَ إِلَّآ أَنَا۠ فَٱتَّقُونِ ﴿٢﴾ خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ بِٱلْحَقِّ ۚ تَعَٰلَىٰ عَمَّا يُشْرِكُونَ ﴿٣﴾ خَلَقَ ٱلْإِنسَٰنَ مِن نُّطْفَةٍ فَإِذَا هُوَ خَصِيمٌ مُّبِينٌ ﴿٤﴾ وَٱلْأَنْعَٰمَ خَلَقَهَا ۗ لَكُمْ فِيهَا دِفْءٌ وَمَنَٰفِعُ وَمِنْهَا تَأْكُلُونَ ﴿٥﴾ وَلَكُمْ فِيهَا جَمَالٌ حِينَ تُرِيحُونَ وَحِينَ تَسْرَحُونَ ﴿٦﴾



(٩١) ئەوانەی رایان دەربارەی قورئان جۆراوجۆرە، بەهەندێکی باوەڕیان هەیەو، هەندێکی ناچێتە مێشکیانەوە، یاخود هەندێکی پەیڕەوی دەکەن و هەندێکی پەیڕەوی ناکەن.

(٩٢) سوێند بەپەروەردگارت پرسیار لەهەموویان دەکەین بەگشتی (لە بیروباوەڕی هەموویان دەکۆڵینەوە).

(٩٣) لەو کارو کردەوانەی کە دەیانکرد.

(٩٤) هەر فەرمانێکت پێدراوە (ئەی محمد ﷺ) بە رێک و پێکی) ئەنجامی بدەو گوێ مەدە بە بوختان و رەفتاری موشریک و هاوەڵگەران.

(٩٥) ئێمە تۆ دەپارێزین (لە شەڕو پیلانی) گاڵتەچی و گاڵتەجاران.

(٩٦) ئەوانەی لەگەڵ خوای گەورەدا خوایەکی تر بڕیار دەدەن، جا لە ئایندەدا هەموو راستیەکیان بۆ روون دەبێتەوەو دەیزانن.

(٩٧) سوێند بە خوا ئێمە چاک دەزانین کە بەراستی دڵی تۆ تەنگ دەبێت بەو گوفتارە نابەجێیەی کە خوانەناسان دەیڵێن.

(٩٨) (جا لە هەموو کاتێکدا، بەتایبەت لەکاتی دڵ تەنگیدا) تەسبیحات و سوپاس و ستایشی پەروەردگارت بکە و لە ڕیزی سوژدە بەراندابە.

(٩٩) بەردەوامیش پەروەردگارت بپەرستە هەتا مردن یەخەت پێدەگرێت (ئەو کاتە ئیتر بەیەک جاریی رزگارت دەبێت لە هەموو ناخۆشیەکان).

سورەتی (النحل)

بەناوی خوای بەخشندە و میهرەبان

(١) فەرمانی خوا بەڕێوەیە و واگەیشت، پەلەی لێمەکەن و پەلەتان نەبێت، پاکی و بڵندی بۆ ئەو زاتەیە لەوەی کە هاوەڵگەران دەیکەنە هاوەڵ و شەریک بۆ خوا.

(٢) پەروەردگار، خۆی فریشتەکان بەرەحمەت و ژیانەوە (کە وەحی ئاسمانیە) دەنێرێت بۆ هەرکەس بیەوێت لە بەندەکانی (کە پێغەمبەرانن)، فەرمانیان پێدەدات کە: خەڵکی بێدار بکەنەوە لەوەی کە بەراستی جگە لە من خوایەکی تر نیە، لەبەر ئەوە لە خەشم و قینم خۆتان بپارێزن (چونکە لەو کەسانە خۆش نابم کە غەیری من دەپەرستن).

(٣) (ئەو زاتە) ئاسمانەکان و زەوی لەسەر بنچینەی حەق و راستی دروست کردووە، بەرز و بڵندە لەوەی (نەفامان) شەریک و هاوبەشی بۆ بڕیار بدەن.

(٤) ئادەمیزادیشی لەتاکە نوتفەیەک بەدیهێناوە، کەچی ئەو، دوای ماوەیەک کە خۆی ناسیوە بووەتە دوژمنێکی ئاشکرا (بێ ئەوەی هیچ خراپەیەکمان بۆی بووبێت جگە لە چاکە).

(٥) مالاتیشی دروستکردووە بۆ خزمەتی ئێوە، (لە خوری و موو پێستیان جۆرەها پۆشاک و رایەخ دروست دەکەن) کە گەرمیتان پێ دەبەخشێت(لە سەرماو سۆڵەدا)، هەروەها جۆرەها سوودی تری لێ وەردەگرن لە شیرو گۆشتەکەشی دەخۆن...

(٦) کاتێک مالاتەکان دەهێننەوە لە ئێوارانداا (بەتێری و شیرەوە)، لە بەرەبەیانەکانیشدا کە لە ماڵ دەریان دەکەن، دیمەنێکی جوانتان بۆ دەنوێنن (دەروونی ئیماندار دەخرۆشێنن، بەجیاوازی شێوازو قەبارەو دەنگ و رەنگ و یاری و گەمەیان).

وَتَحۡمِلُ أَثۡقَالَكُمۡ إِلَىٰ بَلَدٖ لَّمۡ تَكُونُواْ بَٰلِغِيهِ إِلَّا بِشِقِّ ٱلۡأَنفُسِۚ إِنَّ رَبَّكُمۡ لَرَءُوفٞ رَّحِيمٞ ٧ وَٱلۡخَيۡلَ وَٱلۡبِغَالَ وَٱلۡحَمِيرَ لِتَرۡكَبُوهَا وَزِينَةٗۚ وَيَخۡلُقُ مَا لَا تَعۡلَمُونَ ٨ وَعَلَى ٱللَّهِ قَصۡدُ ٱلسَّبِيلِ وَمِنۡهَا جَآئِرٞۚ وَلَوۡ شَآءَ لَهَدَىٰكُمۡ أَجۡمَعِينَ ٩ هُوَ ٱلَّذِيٓ أَنزَلَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءٗۖ لَّكُم مِّنۡهُ شَرَابٞ وَمِنۡهُ شَجَرٞ فِيهِ تُسِيمُونَ ١٠ يُنۢبِتُ لَكُم بِهِ ٱلزَّرۡعَ وَٱلزَّيۡتُونَ وَٱلنَّخِيلَ وَٱلۡأَعۡنَٰبَ وَمِن كُلِّ ٱلثَّمَرَٰتِۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَةٗ لِّقَوۡمٖ يَتَفَكَّرُونَ ١١ وَسَخَّرَ لَكُمُ ٱلَّيۡلَ وَٱلنَّهَارَ وَٱلشَّمۡسَ وَٱلۡقَمَرَۖ وَٱلنُّجُومُ مُسَخَّرَٰتُۢ بِأَمۡرِهِۦٓۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَٰتٖ لِّقَوۡمٖ يَعۡقِلُونَ ١٢ وَمَا ذَرَأَ لَكُمۡ فِي ٱلۡأَرۡضِ مُخۡتَلِفًا أَلۡوَٰنُهُۥٓۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَةٗ لِّقَوۡمٖ يَذَّكَّرُونَ ١٣ وَهُوَ ٱلَّذِي سَخَّرَ ٱلۡبَحۡرَ لِتَأۡكُلُواْ مِنۡهُ لَحۡمٗا طَرِيّٗا وَتَسۡتَخۡرِجُواْ مِنۡهُ حِلۡيَةٗ تَلۡبَسُونَهَاۖ وَتَرَى ٱلۡفُلۡكَ مَوَاخِرَ فِيهِ وَلِتَبۡتَغُواْ مِن فَضۡلِهِۦ وَلَعَلَّكُمۡ تَشۡكُرُونَ ١٤

(٧) هەندێک لەو ماڵاتانە بارو کەل و پەلی سەنگینتان هەڵدەگرن بۆ وڵات و شوێنێک کە ئێوە دوای زەحمەت و ماندوو بوونێکی زۆر نەبێت پێی نەدەگەیشتن، بەڕاستی پەروەردگارتان زاتێکی زۆر بەسۆزو میهرەبانە (بۆ نەوەکانی ئادەم).

(٨) هەروەها چەندەها جۆری ئەسپ و ماین و هێسترو گوێدرێژی بۆ بەدیهێناون تا بۆ سواری و گواستنەوە بەکاری بهێنن، سەرەڕای دیمەنی قەشەنگیان (بەتایبەت ئەسپ و ماین، کە لە سەردەمی زانستی و تەکنۆلۆژیادا هەر بەکار دێن)و شتی تریش دروست دەکات کە ئێستە ئێوە نایزانن (ئەم ئاماژە قورئانییە، هەموو هۆیەکانی گواستنەوەی ئاسمانی و دەریایی و زەمینی دەگرێتەوە کە ئادەمیزاد پەی پێ بردووە و پەی پێدەبات، چونکە ئادەمیزاد خۆی و زانیاری و زانستەکەی و کەرەستە خاوەکان، هەر هەمووی بەخششی خوای بەدیهێنەری تواناو زانایە).

(٩) ڕوونکردنەوەی ڕێبازی ڕاست و بەرنامەی دروست لەسەر خوایە (دەبێت وریا بن) هەندێک ڕێبازی لارو چەوت و نارێکیش هەیە، خۆ ئەگەر بیویستایە هیدایەتی هەر هەمووتانی دەدا بەگشتی (سەرپشکی نە دەکردن، بەڵام ڕێزی لێناون).

(١٠) (پەروەردگار) ئەو زاتەیە کە لە ئاسمانەوە بارانتان بۆ دەبارێنێت کە لێی دەخۆنەوە، هەروەها تێکەڵ بە جۆرەها شەربەت و شلەمەنیش دەیخۆنەوە و دەبێتە هۆی ڕوان و گەشەکردنی درەخت و گژوگیاو ماڵاتی تیادا دەلەوەڕێنن.

(١١) هەر بەو بارانە خوای گەورە جۆرەها کشتوکاڵ دەهێنێتە بەرهەم بۆتان، هاوڕێ لەگەڵ زەیتون و خورماو جۆرەها تری، لە هەموو جۆرە بەروبوومێکیش، بەڕاستی ئا لەوەدا بەڵگەو نیشانەی تەواو هەیە بۆ کەسانێک کە بیربکەنەوە.

(١٢) هەروەها شەوو ڕۆژو خۆرو مانگی بۆ ئێوە ڕام هێناوە، ئەستێرەکانیش بەفەرمانی ئەو زاتە ڕام هێنراون، بە ڕاستی ئا لەو دیاردەو دروست کراوانەدا بەڵگە و نیشانەی زۆر هەن بۆ کەسانێک کە عەقڵ و ژیریان بخەنەکار.

(١٣) هەروەها شتی زۆرو جۆراو جۆرو هەمەڕەنگی لە زەویدا بۆ بەدیهێناون، کە بەڕاستی ئا لەوەشدا بەڵگە هەیە بۆ کەسانێک کە یاداوەری وەردەگرن.

(١٤) هەر ئەو زاتەیە کە دەریای بۆ بار هێناون تا گۆشتی تەڕو تازەی لێ بخۆن، تا لە ناویدا جۆرەها گەوهەرو مرواری دەربهێنن و لە دەست و ملی بکەن، هەروەها کەشتیەکان دەبینیت دەریا لەت دەکەن، تا فەزڵ و بەخششی تری پەروەردگار بەدەست بهێنن، بۆ ئەوەی سوپاسگوزاریش بکەن.

وَأَلْقَىٰ فِي ٱلْأَرْضِ رَوَٰسِيَ أَن تَمِيدَ بِكُمْ وَأَنْهَٰرًا وَسُبُلًا لَّعَلَّكُمْ تَهْتَدُونَ ﴿١٥﴾ وَعَلَٰمَٰتٍ ۚ وَبِٱلنَّجْمِ هُمْ يَهْتَدُونَ ﴿١٦﴾ أَفَمَن يَخْلُقُ كَمَن لَّا يَخْلُقُ ۗ أَفَلَا تَذَكَّرُونَ ﴿١٧﴾ وَإِن تَعُدُّوا۟ نِعْمَةَ ٱللَّهِ لَا تُحْصُوهَآ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ لَغَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿١٨﴾ وَٱللَّهُ يَعْلَمُ مَا تُسِرُّونَ وَمَا تُعْلِنُونَ ﴿١٩﴾ وَٱلَّذِينَ يَدْعُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ لَا يَخْلُقُونَ شَيْـًٔا وَهُمْ يُخْلَقُونَ ﴿٢٠﴾ أَمْوَٰتٌ غَيْرُ أَحْيَآءٍ ۖ وَمَا يَشْعُرُونَ أَيَّانَ يُبْعَثُونَ ﴿٢١﴾ إِلَٰهُكُمْ إِلَٰهٌ وَٰحِدٌ ۚ فَٱلَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ بِٱلْءَاخِرَةِ قُلُوبُهُم مُّنكِرَةٌ وَهُم مُّسْتَكْبِرُونَ ﴿٢٢﴾ لَا جَرَمَ أَنَّ ٱللَّهَ يَعْلَمُ مَا يُسِرُّونَ وَمَا يُعْلِنُونَ ۚ إِنَّهُۥ لَا يُحِبُّ ٱلْمُسْتَكْبِرِينَ ﴿٢٣﴾ وَإِذَا قِيلَ لَهُم مَّاذَآ أَنزَلَ رَبُّكُمْ ۙ قَالُوٓا۟ أَسَٰطِيرُ ٱلْأَوَّلِينَ ﴿٢٤﴾ لِيَحْمِلُوٓا۟ أَوْزَارَهُمْ كَامِلَةً يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ ۙ وَمِنْ أَوْزَارِ ٱلَّذِينَ يُضِلُّونَهُم بِغَيْرِ عِلْمٍ ۗ أَلَا سَآءَ مَا يَزِرُونَ ﴿٢٥﴾ قَدْ مَكَرَ ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ فَأَتَى ٱللَّهُ بُنْيَٰنَهُم مِّنَ ٱلْقَوَاعِدِ فَخَرَّ عَلَيْهِمُ ٱلسَّقْفُ مِن فَوْقِهِمْ وَأَتَىٰهُمُ ٱلْعَذَابُ مِنْ حَيْثُ لَا يَشْعُرُونَ ﴿٢٦﴾

(١٥) هەر خوا لەسەر رووكاری زەوی چیاكانی چەسپاندووە تا لەنگەری بگرێت و ئێوە نەلەرزێنێت و لارتان نەكاتەوە و زێرەو ژوور نەبن، هەروەها چەم و رووبار و رێگەوبانی تیادا بەدیهێناوە، بۆ ئەوەی رێ دەركەن و بەمەرامی خۆتان بگەن.

(١٦) هەروەها نیشانەی زۆرو زەبەندەی لە زەویدا دابین كردووە (وەكو كەژو كێوەكان و، چەم و رووبارەكان و بەرزی و نشێوەكان، تا ون نەبن، لە شەوگاریشدا)و بەهۆی ئەستێرەكانەوە خەڵكی رێی خۆیان دەربكەن.

(١٧) (باشە ئەی هۆشمەندەكان) ئایا ئەو زاتەی ئەم هەموو دروستكراوە سەر سوڕهێنەرانەی بەدیهێناوە، وەكو ئەو كەسە وایە كە ناتوانێت هیچ بەدی بهێنێت، ئایا ئەوە بۆ لێكی نادەنەوە و یاداوەری وەرناگرن؟

(١٨) خۆ ئەگەر بێن و بتانەوێت نازونیعمەتەكانی خوا بژمێرن، بۆتان ناژمێردرێت (لە ئەندامەكانی دەرەوەو ناوەوەی خۆتان و ئەو رزق و رۆزیانەی كە دەیخۆن و ئەو پۆشاك و رایەخ و ناومالەی بەكاری دەهێنن...هتد، سەرەڕای هەزاران هەزار دروستكراوانی تری دیارو نادیار لە جیهانی ماددە و رووەك و گیاندارو...هتد)، سەرەڕای كەم سوپاسیتان لەو هەموو نازو نیعمەتە بێ شومارە) بەراستی خوای پەروەردگار هەر لێخۆش بوو میهرەبانە.

(١٩) هەروەها ئەو خوایە دەزانێت چی دەشارنەوە و چیش دەردەخەن و ئاشكرای دەكەن لە(گفتوگۆو نیەت و كارو كردەوەتان).

(٢٠) ئەو بت و كەس و شتانەی كە هاواریان لێ دەكەن و دەیانپەرستن جگە لە خوا، هیچیان پێ دروست ناكرێت، لەكاتێكدا كە خۆیان دروست دەكرێن.

(٢١) ئەوانە مردوون و زیندوو نین، هەستیش ناكەن كەی خۆیان و خەڵكی زیندوو دەكرێنەوە.

(٢٢) ئەو پەروەردگارەی ئێوە (كە حەق وایە هەر ئەو بپەرستن) خوایەكی تاك و تەنهایە، جا ئەوانەی باوەڕیان بە قیامەت نیە دڵەكانیان هەمیشە ئینكاری هەموو راستیەك دەكات، لەكاتێكدا ئەوانە خۆیان بەگەورە دەزانن و فیزدەكەن.

(٢٣) شتێكی راستەو گومانی تێدانیە كە خوای گەورە ئاگایە بەوەی پەنهانی دەكەن و دەیشارنەوە، بەوەش كە دەری دەخەن و ئاشكرای دەكەن، بەراستی ئەو زاتە ئەو كەسانەی خۆش ناوێت كە لووت بەرزو خۆ بەگەورە دەنوێنن.

(٢٤) خۆ ئەگەر بە(بێباوەڕان) بوترێت: ئەوە پەروەردگارتان چی دابەزاندووە؟! ئەوە (بێ شەرمانە) دەڵێن: چیرۆك و داستانی كۆن و خەیاڵیی پێشینانە!!

(٢٥) ئەوانە دەبێت لە رۆژی قیامەتدا كوڵی گوناهو تاوانی خۆیان بەتەواوی هەڵگرن، هەروەها لەگوناهی ئەوانەش هەڵدەگرن كە گومڕایان كردوون بێ زانستی و زانیاری (بێ ئەوەی لە كوڵ و باری ئەوان كەم بێتەوە)، ئاگاداربن! چەند خراپ و ناشرینە ئەوبارە گرانەی كە هەڵی دەگرن (چ گیرێكیان خواردوە).

(٢٦) بێگومان پێش ئەمانیش (خوانەناسانی) پێشوو پیلانیان گێڕا (دژ بەئایینی خوا)، ئینجا خوای بەدەسەڵاتیش كۆشك و تەلارو ئەخشەیانی لە بن و بێخ دەرهێنا، سەقفەكەشی لە سەرەوە دارمان بەسەریانداو لە شوێنێكەوە بەڵاو سزا یەخەی پێگرتن كە هەستیان پێ نەدەكردو بەتەمای نەبوون (ئەڵبەتە ئەم هەرەشەیە پیلانگێرانی هەموو سەردەمێك دەگرێتەوە).

ثُمَّ يَوْمَ الْقِيَامَةِ يُخْزِيهِمْ وَيَقُولُ أَيْنَ شُرَكَائِيَ الَّذِينَ كُنتُمْ تُشَاقُّونَ فِيهِمْ ۚ قَالَ الَّذِينَ أُوتُوا الْعِلْمَ إِنَّ الْخِزْيَ الْيَوْمَ وَالسُّوءَ عَلَى الْكَافِرِينَ ﴿٢٧﴾ الَّذِينَ تَتَوَفَّاهُمُ الْمَلَائِكَةُ ظَالِمِي أَنفُسِهِمْ ۖ فَأَلْقَوُا السَّلَمَ مَا كُنَّا نَعْمَلُ مِن سُوءٍ ۚ بَلَىٰ إِنَّ اللَّهَ عَلِيمٌ بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴿٢٨﴾ فَادْخُلُوا أَبْوَابَ جَهَنَّمَ خَالِدِينَ فِيهَا ۖ فَلَبِئْسَ مَثْوَى الْمُتَكَبِّرِينَ ﴿٢٩﴾ ۞ وَقِيلَ لِلَّذِينَ اتَّقَوْا مَاذَا أَنزَلَ رَبُّكُمْ ۚ قَالُوا خَيْرًا ۗ لِّلَّذِينَ أَحْسَنُوا فِي هَٰذِهِ الدُّنْيَا حَسَنَةٌ ۚ وَلَدَارُ الْآخِرَةِ خَيْرٌ ۚ وَلَنِعْمَ دَارُ الْمُتَّقِينَ ﴿٣٠﴾ جَنَّاتُ عَدْنٍ يَدْخُلُونَهَا تَجْرِي مِن تَحْتِهَا الْأَنْهَارُ ۖ لَهُمْ فِيهَا مَا يَشَاءُونَ ۚ كَذَٰلِكَ يَجْزِي اللَّهُ الْمُتَّقِينَ ﴿٣١﴾ الَّذِينَ تَتَوَفَّاهُمُ الْمَلَائِكَةُ طَيِّبِينَ ۙ يَقُولُونَ سَلَامٌ عَلَيْكُمُ ادْخُلُوا الْجَنَّةَ بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴿٣٢﴾ هَلْ يَنظُرُونَ إِلَّا أَن تَأْتِيَهُمُ الْمَلَائِكَةُ أَوْ يَأْتِيَ أَمْرُ رَبِّكَ ۚ كَذَٰلِكَ فَعَلَ الَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ ۚ وَمَا ظَلَمَهُمُ اللَّهُ وَلَٰكِن كَانُوا أَنفُسَهُمْ يَظْلِمُونَ ﴿٣٣﴾ فَأَصَابَهُمْ سَيِّئَاتُ مَا عَمِلُوا وَحَاقَ بِهِم مَّا كَانُوا بِهِ يَسْتَهْزِئُونَ ﴿٣٤﴾



(٢٧) لەوەودواش، لە رۆژی قیامەتدا خوا ئەو پیلانگێرانە خەجاڵەت و ریسوا دەکات و پێیان دەڵێت: کوان و لەکوێن هاوەڵەکانم؟ ئەوانەی کە دژایەتی سەرسەختتان دەکرد لە بارەیانەوە، (ئیمانداران) ئەوانەی کە زانیاری و زانستی خواناسیان پێدراوە دەڵێن: بەراستی ئەمڕۆ سەرشۆڕی و خەجاڵەتی و نەهامەتی و سزا لەسەر بێباوەڕانە.

(٢٨) ئەوانەی کە فریشتەکان لە سەرەمەرگدا گیانیان دەکێشن، لەکاتێکدا کە بەردەوامن لەسەر ستەم لە خۆیان (بەهۆی بێباوەڕی و یاخی بونیانەوە) ئینجا بەناچاری تەسلیمن و دەڵێن: ئێمە هیچ گوناهو هەڵەیەکمان نەکردووە، فریشتەکان دەڵێن: نەخێر وا نی یە (ئەوە ئێوە لە بیرتان کردووە) ئەگینا بەراستی خوا ئاگادارو زانایە بەهەموو ئەو کارو کردەوانەی کە دەتانکرد و ئەنجامتان دەدا.

(٢٩) کەواتە لە دەروازەکانی دۆزەخەوە بچنە ژوورەوەو بۆ هەمیشەیی و نەبڕاوەش تیادا بن، ئای کە جێگە و رێگەی خۆ بەزل زانەکان ناخۆش و نالەبارو ناسۆرە.

(٣٠) لەولاشەوە بەو کەسانە دەوترێت کە خواناسی و پارێزکاریان کردووە: پەروەردگارتان چی رەوانە کردووە؟ چ بەرنامە و کتێبێکی دابەزاندووە؟، هەموان دەڵێن: خێرو بەرەکەت، (بۆ هەردوو جیهان)، بۆ ئەو کەسانەی کە لەم جیهانەدا چاکەیان کردووە، چاکە دێتەوە رێیان، بێگومان جێگە و رێگەی ئەو جیهان خۆشترو چاکترو سازگارترو پڕ لە نازو نیعمەتترە (بەراورد ناکرێت لەگەڵ دنیادا) ئای کەچەندە جێگە و رێگە و کۆشک و تەلاری خواناس و پارێزکاران سازگارو خۆش و جوان و رازاوەیە...

(٣١) (ئەو جێگە و رێگەیە) باخەکانی بەهەشتی ـ عەدنە ـ بەختەوەران دەچنە ناوی، چەندەها رووبار بە بەردەم کۆشکەکان و بەژێر درەختەکانیدا جاری و رەوانە، هەرچیەک بخوازن و هەرچی ئارەزوو بکەن و هەرچی داوا بکەن، بۆیان ئامادەیە تیایدا، ئا بەو شێوەیە خوای میهرەبان پاداشتی خواناس و پارێزکاران دەداتەوە...

(٣٢) ئەوانەی کە لە سەرەمەرگدا فریشتەکان دێن بۆ لایان لەکاتێکدا گیانی پاک و پیرۆزیان دەکێشن (کە دوورە لە بێباوەڕی)و پێیان دەڵێن: سڵاوتان لێ بێت (ئیتر رزگارتان بوو، ئیتر ناخۆشی نەما) دە بچنە ناو ئەو بەهەشتەوە، بە هۆی ئەو کارو کردەوانەوە کە کاتی خۆی دەتانکرد.

(٣٣) ئایا خوانەناسان چاوەڕێی چی دەکەن؟ مەگەر هەر چاوەڕێی ئەوە بن کتوپڕ فریشتەی گیانکێشان یەخەیان پێدەگرێت، یان فەرمانی پەروەردگارت دەربچێت بۆ تۆڵەسەندن، هەروەها ئەوانەی پێش ئەمانیش هەر رەفتاری وا نالەباریان کردووە، جا وەنەبێت خوا ستەمی لێکردبن بەڵکو هەر خۆیان ستەم لە خۆیان دەکرد.

(٣٤) سەرەنجام هەرچی گوناهو خراپەیەکیان ئەنجام دابوو هاتەوە رێیان، ئەو هەڕەشە و دۆزەخەی کە گاڵتەیان پێدەکرد یەخەی پێگرتن و دەورەی دان.

وَقَالَ ٱلَّذِينَ أَشۡرَكُواْ لَوۡ شَآءَ ٱللَّهُ مَا عَبَدۡنَا مِن دُونِهِۦ مِن شَيۡءٖ نَّحۡنُ وَلَآ ءَابَآؤُنَا وَلَا حَرَّمۡنَا مِن دُونِهِۦ مِن شَيۡءٖۚ كَذَٰلِكَ فَعَلَ ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِهِمۡۚ فَهَلۡ عَلَى ٱلرُّسُلِ إِلَّا ٱلۡبَلَٰغُ ٱلۡمُبِينُ ٣٥ وَلَقَدۡ بَعَثۡنَا فِي كُلِّ أُمَّةٖ رَّسُولًا أَنِ ٱعۡبُدُواْ ٱللَّهَ وَٱجۡتَنِبُواْ ٱلطَّٰغُوتَۖ فَمِنۡهُم مَّنۡ هَدَى ٱللَّهُ وَمِنۡهُم مَّنۡ حَقَّتۡ عَلَيۡهِ ٱلضَّلَٰلَةُۚ فَسِيرُواْ فِي ٱلۡأَرۡضِ فَٱنظُرُواْ كَيۡفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلۡمُكَذِّبِينَ ٣٦ إِن تَحۡرِصۡ عَلَىٰ هُدَىٰهُمۡ فَإِنَّ ٱللَّهَ لَا يَهۡدِي مَن يُضِلُّۖ وَمَا لَهُم مِّن نَّٰصِرِينَ ٣٧ وَأَقۡسَمُواْ بِٱللَّهِ جَهۡدَ أَيۡمَٰنِهِمۡ لَا يَبۡعَثُ ٱللَّهُ مَن يَمُوتُۚ بَلَىٰ وَعۡدًا عَلَيۡهِ حَقّٗا وَلَٰكِنَّ أَكۡثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعۡلَمُونَ ٣٨ لِيُبَيِّنَ لَهُمُ ٱلَّذِي يَخۡتَلِفُونَ فِيهِ وَلِيَعۡلَمَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ أَنَّهُمۡ كَانُواْ كَٰذِبِينَ ٣٩ إِنَّمَا قَوۡلُنَا لِشَيۡءٍ إِذَآ أَرَدۡنَٰهُ أَن نَّقُولَ لَهُۥ كُن فَيَكُونُ ٤٠ وَٱلَّذِينَ هَاجَرُواْ فِي ٱللَّهِ مِنۢ بَعۡدِ مَا ظُلِمُواْ لَنُبَوِّئَنَّهُمۡ فِي ٱلدُّنۡيَا حَسَنَةٗۖ وَلَأَجۡرُ ٱلۡأٓخِرَةِ أَكۡبَرُۚ لَوۡ كَانُواْ يَعۡلَمُونَ ٤١ ٱلَّذِينَ صَبَرُواْ وَعَلَىٰ رَبِّهِمۡ يَتَوَكَّلُونَ ٤٢

(٣٥) ئەوانەی هاوەڵیان داناوە بۆ خوا دەڵێن: ئەگەر خوا ویستی لەسەر بوایە هیچ شتێکمان لەجیاتی ئەو نەدەپەرست، نە ئێمەو نە باوو باپیرانیشمان، هیچ شتێکیشمان لە خۆمان حەرام نەدەکرد بەبێ ئەو، خوانەناسانی پێش ئەمانیش هەروایان دەکردو هەر وایان دەوت، مەگەر ئەرکی سەرشانی پێغەمبەران هەر ئەوە نیە کە ئایینی خوا بە روونی رابگەیەنن؟

(٣٦) سوێند بەخوا بێگومان ئێمە لەناو هەر گەل و نەتەوەیەکدا پێغەمبەرێکمان رەوانە کردووەو پێمان راگەیاندووە کە پێیان بڵێت: تەنها خوا بپەرستن، خۆتان دوورە پەرێز بگرن لە هەموو پەرستراوێکی تر، جا هەبوو لەو خەڵکە (کە بیرو هۆش و ژیری خۆی خستەکارو بەشوێن راستیدا دەگەڕا) خوایش هیدایەتی دەدا، هەشیان بوو خۆی شایستەی گومڕایی دەکردو بەسەریدا دەچەسپا، کەوابوو بگەڕێن بەسەر زەویداو سەرنج بدەن، بزانن چۆن بوو سەرەنجامی ئەو کەسانەی بڕوایان بە بەرنامەی ئێمە نەبوو.

(٣٧) خۆ ئەگەر تۆ زۆر سوور بیت لەسەر هیدایەتدانی ئەوان، ئەوە تۆ ناتوانیت، چونکە بەراستی خوا رێنموویی کەسێک ناکات کە خەڵک گومڕا بکات، ئەوانە (لە قیامەتدا) هیچ جۆرە پشتیوانێکیان نیە.

(٣٨) بێباوەڕان سوێندیان دەخواردو جەختیان لەسەر سوێندەکەیان دەکردو دەیانوت: ئەوەی بمرێت خوا زیندووی ناکاتەوە! نەخێر، زیندووی دەکاتەوە، ئەوە بەڵێنێکی راست و دروستی خوایە و لێی پاشگەز نابێتەوە، بەڵام زۆربەی خەڵکی ئەم راستیە نازانن و بڕوای پێناکەن.

(٣٩) بێگومان خوا هەموان زیندوو دەکاتەوە تا بۆیان روون بکاتەوە و بۆیان دەربخات، ئەوەی ئەوان کێشەیان لەسەری هەبوو، بڕوایان پێی نەبوو هاتە دی، تا ئەوانەی کە بێباوەڕ بوون بێگومان ئەوان درۆزن بوون.

(٤٠) بەراستی کاتێک زیندووکردنەوە و بەدیهێنانی هەر شتێکمان بوێت، تەنها ئەوەندەی دەوێت پێی بڵێین ـ ببە ـ دەستبەجێ ئەویش ـ دەبێت ـ.

(٤١) ئەو کەسانەی لەبەر خواو بۆ خوا کۆچیان کرد (بۆ پاراستنی ئیمانەکەیان) دوای ئەوەی کە ستەمیان لێکرابوو، ئەوە هەر لە دنیادا بەچاکی و رێزەوە نیشتەجێیان دەکەین، بێگومان پاداشتی ئەو جیهان گەورەترو فراوانترە بۆیان، ئەگەر دەیانزانی.

(٤٢) ئەوانەش ئەوانەن کە بە ئارام و خۆگر بوون و پشت بە پەروەردگاریان دەبەستن.

وَمَآ أَرْسَلْنَا مِن قَبْلِكَ إِلَّا رِجَالًا نُّوحِىٓ إِلَيْهِمْ فَسْـَٔلُوٓا۟ أَهْلَ ٱلذِّكْرِ إِن كُنتُمْ لَا تَعْلَمُونَ ﴿٤٣﴾ بِٱلْبَيِّنَٰتِ وَٱلزُّبُرِ وَأَنزَلْنَآ إِلَيْكَ ٱلذِّكْرَ لِتُبَيِّنَ لِلنَّاسِ مَا نُزِّلَ إِلَيْهِمْ وَلَعَلَّهُمْ يَتَفَكَّرُونَ ﴿٤٤﴾ أَفَأَمِنَ ٱلَّذِينَ مَكَرُوا۟ ٱلسَّيِّـَٔاتِ أَن يَخْسِفَ ٱللَّهُ بِهِمُ ٱلْأَرْضَ أَوْ يَأْتِيَهُمُ ٱلْعَذَابُ مِنْ حَيْثُ لَا يَشْعُرُونَ ﴿٤٥﴾ أَوْ يَأْخُذَهُمْ فِى تَقَلُّبِهِمْ فَمَا هُم بِمُعْجِزِينَ ﴿٤٦﴾ أَوْ يَأْخُذَهُمْ عَلَىٰ تَخَوُّفٍ فَإِنَّ رَبَّكُمْ لَرَءُوفٌ رَّحِيمٌ ﴿٤٧﴾ أَوَلَمْ يَرَوْا۟ إِلَىٰ مَا خَلَقَ ٱللَّهُ مِن شَىْءٍ يَتَفَيَّؤُا۟ ظِلَٰلُهُۥ عَنِ ٱلْيَمِينِ وَٱلشَّمَآئِلِ سُجَّدًا لِّلَّهِ وَهُمْ دَٰخِرُونَ ﴿٤٨﴾ وَلِلَّهِ يَسْجُدُ مَا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِى ٱلْأَرْضِ مِن دَآبَّةٍ وَٱلْمَلَٰٓئِكَةُ وَهُمْ لَا يَسْتَكْبِرُونَ ﴿٤٩﴾ يَخَافُونَ رَبَّهُم مِّن فَوْقِهِمْ وَيَفْعَلُونَ مَا يُؤْمَرُونَ ۩ ﴿٥٠﴾ ۞ وَقَالَ ٱللَّهُ لَا تَتَّخِذُوٓا۟ إِلَٰهَيْنِ ٱثْنَيْنِ إِنَّمَا هُوَ إِلَٰهٌ وَٰحِدٌ فَإِيَّٰىَ فَٱرْهَبُونِ ﴿٥١﴾ وَلَهُۥ مَا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَلَهُ ٱلدِّينُ وَاصِبًا أَفَغَيْرَ ٱللَّهِ تَتَّقُونَ ﴿٥٢﴾ وَمَا بِكُم مِّن نِّعْمَةٍ فَمِنَ ٱللَّهِ ثُمَّ إِذَا مَسَّكُمُ ٱلضُّرُّ فَإِلَيْهِ تَجْـَٔرُونَ ﴿٥٣﴾ ثُمَّ إِذَا كَشَفَ ٱلضُّرَّ عَنكُمْ إِذَا فَرِيقٌ مِّنكُم بِرَبِّهِمْ يُشْرِكُونَ ﴿٥٤﴾



(٤٣) ئێمە پێش تۆش جگە لە پیاوانی (راستگۆو چاك و پاك نەبێت) کەسی ترمان رەوانە نەکردووە و وەحیمان بۆ نەناردووە، ئەگەر هەر بڕوا ناکەن و نایزانن دە ئێوە لە شارەزایان بپرسن؟ (کە رەوانە کراوانی ئێمە پیاوانێکی ناسراو بوون لەناو قەومەکانیاندا).

(٤٤) ئێمە ئەوانمان رەوانەکردووە هاوڕێ لەگەڵ بەڵگەو نیشانەو (موعجیزە) ی زۆرو کتێبی ئاسمانیداو ئێمە قورئانمان بۆتۆ دابەزاند، تا بۆ خەڵکی ئەوە روون بکەیتەوە کە بۆیان هێنراوەتە خوارەوە، بۆ ئەوەی بیرێك بکەنەوە و تێفکرن.

(٤٥) جا ئایا ئەوانەی کە چەندەها پیلان و نەخشەی خراپیان کێشاوە دڵنیان لەوەی کە خوا نایانبات بەناخی زەویدا، یاخود لەلایەکەوە سزاو تۆڵەیان بۆ بێت کە هەر هەستی پێنەکەن؟!...

(٤٦) یاخود لەکاتی هاتوچۆو سەرگەرم بوونیان بە کاروبارەوە لەناویان ببات، ئەوانیش دەستەوسانکەری خوانین؟!...

(٤٧) یاخود (پەروەردگار بەتوانایە) لەکاتی ترس و ناخۆشی وبیمدا.. بیانگرێت و لەناویان بەرێت، بەڵام (مۆڵەت دەدات تا بەڵکو رووبکەنە ئیمان) چونکە بەراستی پەروەردگارتان بەسۆزو میهرەبانە.

(٤٨) ئایا ئەوە نەیانڕوانیوەتە ئەو شتە بێ شومارانەی کەخوا دروستی کردووە؟ کە سێبەرەکەی بەلای راست و بەلای چەپیانەوە دەسوڕێتەوە، لە کاتێکدا هەموویان ملکەچ و فەرمانبەردارن بۆ پەروەردگار، لەحاڵێکیشدا خاوەن سێبەرەکان ملکەچ و زەلیلی ویستی خواین.

(٤٩) هەرچی لە ئاسمانەکان و هەرچی لە زەویدا هەیە سوژدە دەبەن بۆ خوای بەدیهێنەریان، هەروەها هەموو زیندەوەران، فریشتەکانیش بەتایبەت سوژدە دەبەن بۆ خواو خۆ بەگەورە نازانن لە هیچ فەرمانێکی خوا لانادەن.

(٥٠) (جگە لەوەش) ئەو فریشتانە لە پەروەردگاریان دەترسن کە فەرمانڕەوایە بەسەریانەوە، هەرچی فەرمانێکیان پێ بدرێت بەچاکی ئەنجامی دەدەن.

(٥١) خوا فەرموویەتی: هەرگیز نەکەن دوو دانە خوا بۆ خۆتان بڕیار بدەن، چونکە ئەو خوایەی کە پێویستە ئێوە بیپەرستن بێگومان خوایەکی تاك و تەنهایە، کەوابوو بیم و ترستان با هەر لە من بێت.

(٥٢) هەرچی لە ئاسمانەکان و زەویدا هەیە هەر ئەو زاتە خاوەنیانە، هەمیشەو بەردەوام هەر ئەو زاتەیە کە شایستەی ئەوە بێت ئاین و بەرنامە و فەرمانڕەوایی لەو وەربگیرێت و ملکەچی هەر بۆ ئەو بکرێت، ئایا رەوایە بێجگە لە خوا لە کەسی تر بترسن و حسابی بۆ بکەن؟

(٥٣) هەرچی نازو نیعمەتێکتان هەیە هەمووی بەهرەو بەخششی خوایە، پاشان کاتێك ناخۆشی و بەڵایەکتان بۆ پێشهات، ئەوە هاناو هاوارو پەنا هەر بۆ لای ئەو دەبەن و هەر لەو زاتە دەپاڕێنەوە.

(٥٤) لەوەودوا کاتێك بەڵاو ناخۆشی لەسەر لابردن، دەستبەجێ دەستەیەك لە ئێوە هاوەڵ و شەریك بۆ پەروەردگاریان بڕیار دەدەن!!

لِيَكْفُرُوا بِمَا آتَيْنَاهُمْ فَتَمَتَّعُوا فَسَوْفَ تَعْلَمُونَ ﴿٥٥﴾ وَيَجْعَلُونَ لِمَا لَا يَعْلَمُونَ نَصِيبًا مِّمَّا رَزَقْنَاهُمْ تَاللَّهِ لَتُسْأَلُنَّ عَمَّا كُنتُمْ تَفْتَرُونَ ﴿٥٦﴾ وَيَجْعَلُونَ لِلَّهِ الْبَنَاتِ سُبْحَانَهُ وَلَهُم مَّا يَشْتَهُونَ ﴿٥٧﴾ وَإِذَا بُشِّرَ أَحَدُهُم بِالْأُنثَىٰ ظَلَّ وَجْهُهُ مُسْوَدًّا وَهُوَ كَظِيمٌ ﴿٥٨﴾ يَتَوَارَىٰ مِنَ الْقَوْمِ مِن سُوءِ مَا بُشِّرَ بِهِ أَيُمْسِكُهُ عَلَىٰ هُونٍ أَمْ يَدُسُّهُ فِي التُّرَابِ أَلَا سَاءَ مَا يَحْكُمُونَ ﴿٥٩﴾ لِلَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ بِالْآخِرَةِ مَثَلُ السَّوْءِ وَلِلَّهِ الْمَثَلُ الْأَعْلَىٰ وَهُوَ الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ ﴿٦٠﴾ وَلَوْ يُؤَاخِذُ اللَّهُ النَّاسَ بِظُلْمِهِم مَّا تَرَكَ عَلَيْهَا مِن دَابَّةٍ وَلَٰكِن يُؤَخِّرُهُمْ إِلَىٰ أَجَلٍ مُّسَمًّى فَإِذَا جَاءَ أَجَلُهُمْ لَا يَسْتَأْخِرُونَ سَاعَةً وَلَا يَسْتَقْدِمُونَ ﴿٦١﴾ وَيَجْعَلُونَ لِلَّهِ مَا يَكْرَهُونَ وَتَصِفُ أَلْسِنَتُهُمُ الْكَذِبَ أَنَّ لَهُمُ الْحُسْنَىٰ لَا جَرَمَ أَنَّ لَهُمُ النَّارَ وَأَنَّهُم مُّفْرَطُونَ ﴿٦٢﴾ تَاللَّهِ لَقَدْ أَرْسَلْنَا إِلَىٰ أُمَمٍ مِّن قَبْلِكَ فَزَيَّنَ لَهُمُ الشَّيْطَانُ أَعْمَالَهُمْ فَهُوَ وَلِيُّهُمُ الْيَوْمَ وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿٦٣﴾ وَمَا أَنزَلْنَا عَلَيْكَ الْكِتَابَ إِلَّا لِتُبَيِّنَ لَهُمُ الَّذِي اخْتَلَفُوا فِيهِ وَهُدًى وَرَحْمَةً لِّقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ ﴿٦٤﴾

(٥٥) (وازیان لیّ بهێنە) با ناشوکرو سوپاس ناپەرێز بن لە بەرامبەر ئەو هەموو بەخشش و نازو نیعمەتانەوە کە پێمان بەخشیوون، با جارێ رابوێرن ئینجا لە ئایندەدا دەزانن چیتان بەسەر دێت!!

(٥٦) خوانەناسان، هەندێک لەو شتانەی کە ئێمە پێمان بەخشیوون، دادەنێن و بڕیار دەدەن بۆ ئەوانەی کە نەزان و نەفام و بێ دەسەڵاتن (کە بتەکانن)، سوێند بەخوا بێگومان پرسیارتان لێدەکرێت دەربارەی هەموو ئەو درۆو پڕو پاگەندەیەی کە هەڵتان دەبەست.

(٥٧) ئەو نەفامانە کچان دەدەنە پاڵ خوا (گوایە فریشتەکان کچی خوان)، پاکی و بێگەردی شایستەی ئەو زاتەیە هیچ پێویستیەکی بە کچ و کوڕ نیە لە کاتێکدا بۆ خۆیان حەز بەچی دەکەن ئەوە بۆ خۆیان دادەنێن!!

(٥٨) خۆ ئەگەر مژدەی بوونی کچ بدرێت بە یەکێک لەو نەفامانە، ڕووی گرژو تاڵ دەبێت و ڕەش دادەگیرسێت و سینەی پڕ دەبێت لە خەم و پەژارە...

(٥٩) لە داخ و خەفەتی ئەو مژدە ناخۆشە، خۆی دەشارێتەوە لە خەڵکی و بەتەنها (بیردەکاتەوە): ئایا بیهێڵێتەوە بە زەلیلی و سووکی و بێ نرخی، یاخود زیندە بەچاڵی بکات و بیخاتە توێی خاکەوە، ئاگاداربن؟! ئای کە چەندە خراپە ئەو بڕیارەی کە دەیدەن!! (وەچەو نەوەی خۆیان زیندە بەچاڵ دەکەن).

(٦٠) سیفەت و ناونیشانی ناشیرین و نزم و خراپ شایستەی ئەوانەیە کە باوەڕ بەقیامەت ناکەن، خوای پەروەردگاریش خاوەنی هەموو سیفاتی بەرزو بڵندو پیرۆزەو ئەو زاتە هەر خۆیشی باڵادەست و دانایە.

(٦١) خۆ ئەگەر خوا خەڵکی لەناو ببات و بیانپێچێتەوە بەهۆی ستەمیانەوە (ئەوەندە گوناهو تاوان زۆرە) زیندەوەر لەسەر زەویدا نایەڵێت (یەعنی هەر زەوی خاپوور دەکات بەهەموو گیانلەبەرانەوە، بەڵام ئەو خوایە ئارامی و خۆگریی بێسنوورە) لەبەرئەوە تا کاتێکی دیاری کراو مۆڵەتی ئەو خەڵکە دەدات و دوایان دەخات، جا کاتێک کاتە دیاری کراوەکەیان هات، نەتاوێک دوادەکەون، نەتاوێک پێشیش دەکەون (بەڵکو لە چرکەی دیاری کراوی خۆیدا لەناو دەبرێن).

(٦٢) خوانەناسان ئەوەی بۆ خۆیان پێیان خۆش نیە و نایانەوێت بۆ خوای بڕیار دەدەن، (گوایە فریشتەکان کچن و کچی خوایشن)و لەکاتێکدا زمانیان باس و خواسی درۆدەکات کە بێگومان بەنیازن لەو دنیاش بەهەشت و خۆشی بۆ ئەوان بێت، شتێکی ڕاستەو گومانی تێدانیە ئاگری دۆزەخ بۆ ئەوانە و بەڕاستی بەپەلە فڕێ دەدرێنە ناوی و فەرامۆش دەکرێن.

(٦٣) سوێند بەخوا پێش تۆ بۆ گەل و قەومەکانی تریش پێغەمبەرانمان ڕەوانە کردووە، بەڵام شەیتان کاروکردەوەی (نادروست و هەڵەیانی) بۆ ڕازاندوونەتەوە، ئەمڕۆ لە دنیادا هەر ئەو پشتیوانیانە و سزای بەئێش بۆ ئەوجۆرە قەوم و کەسە نالەبارو ناحاڵیانە ئامادەکراوە.

(٦٤) ئێمە ئەم قورئانەمانمان دانەبەزاندووەتە سەر تۆ تەنها بۆ ئەوە نەبێت کە هەرچی ئەو خەڵکە کێشەی لەسەر هەیە (لە بابەتەکانی دنیاو دین) بۆیان ڕوون بکەیتەوە و بیکەینە هۆی هیدایەت و ڕەحمەتیش بۆ ئەو کەسانەی کە ئیمان و باوەڕ دەهێنن.

وَاللَّهُ أَنزَلَ مِنَ السَّمَاءِ مَاءً فَأَحْيَا بِهِ الْأَرْضَ بَعْدَ مَوْتِهَا ۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَةً لِّقَوْمٍ يَسْمَعُونَ ﴿٦٥﴾ وَإِنَّ لَكُمْ فِي الْأَنْعَامِ لَعِبْرَةً ۖ نُّسْقِيكُم مِّمَّا فِي بُطُونِهِ مِن بَيْنِ فَرْثٍ وَدَمٍ لَّبَنًا خَالِصًا سَائِغًا لِّلشَّارِبِينَ ﴿٦٦﴾ وَمِن ثَمَرَاتِ النَّخِيلِ وَالْأَعْنَابِ تَتَّخِذُونَ مِنْهُ سَكَرًا وَرِزْقًا حَسَنًا ۗ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَةً لِّقَوْمٍ يَعْقِلُونَ ﴿٦٧﴾ وَأَوْحَىٰ رَبُّكَ إِلَى النَّحْلِ أَنِ اتَّخِذِي مِنَ الْجِبَالِ بُيُوتًا وَمِنَ الشَّجَرِ وَمِمَّا يَعْرِشُونَ ﴿٦٨﴾ ثُمَّ كُلِي مِن كُلِّ الثَّمَرَاتِ فَاسْلُكِي سُبُلَ رَبِّكِ ذُلُلًا ۚ يَخْرُجُ مِن بُطُونِهَا شَرَابٌ مُّخْتَلِفٌ أَلْوَانُهُ فِيهِ شِفَاءٌ لِّلنَّاسِ ۗ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَةً لِّقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ ﴿٦٩﴾ وَاللَّهُ خَلَقَكُمْ ثُمَّ يَتَوَفَّاكُمْ ۚ وَمِنكُم مَّن يُرَدُّ إِلَىٰ أَرْذَلِ الْعُمُرِ لِكَيْ لَا يَعْلَمَ بَعْدَ عِلْمٍ شَيْئًا ۚ إِنَّ اللَّهَ عَلِيمٌ قَدِيرٌ ﴿٧٠﴾ وَاللَّهُ فَضَّلَ بَعْضَكُمْ عَلَىٰ بَعْضٍ فِي الرِّزْقِ ۚ فَمَا الَّذِينَ فُضِّلُوا بِرَادِّي رِزْقِهِمْ عَلَىٰ مَا مَلَكَتْ أَيْمَانُهُمْ فَهُمْ فِيهِ سَوَاءٌ ۚ أَفَبِنِعْمَةِ اللَّهِ يَجْحَدُونَ ﴿٧١﴾ وَاللَّهُ جَعَلَ لَكُم مِّنْ أَنفُسِكُمْ أَزْوَاجًا وَجَعَلَ لَكُم مِّنْ أَزْوَاجِكُم بَنِينَ وَحَفَدَةً وَرَزَقَكُم مِّنَ الطَّيِّبَاتِ ۚ أَفَبِالْبَاطِلِ يُؤْمِنُونَ وَبِنِعْمَتِ اللَّهِ هُمْ يَكْفُرُونَ ﴿٧٢﴾

(٦٥) هەر خوا بارانی لە ئاسمانەوە باراندووەو زەوی پێ زیندوو کردۆتەوە دوای ئەوەی کە مردبوو، بەڕاستی لەو دیاردەیەدا نیشانە و بەڵگەی تەواو هەیە بۆ کەسانێک کە گوێ بۆ ڕاستی دەگرن.

(٦٦) بەڕاستی لە بوونی ماڵات و(زیندەوەرانی جۆراو جۆردا) پەندو ئامۆژگاری هەیە بۆتان و جێگەی سەرنج و تێڕامانە، لە نێوان ئەو شتانەی کە لە سکیاندا هەیە، لە گژوگیای هەرس کراوو خوێندا، شیرێکی پاک و بێگەردو خۆش و بەتام وگەوارا بەرهەم دەهێنین بۆ ئەوانەی دەیخۆنەوە.

(٦٧) لە بەروبوومەکانی دارخورما و ڕەزی ترێکانیش (هەندێ جار) شتی سەرخۆشکەر دروست دەکەن، (گەلێ جاریش) بەرهەمی چاک و بەسوود (وەکو دۆشاو و مێوژ و شەربەت، .هتد)، بەڕاستی ئالەوەشدا بەڵگەو نیشانەی ئاشکرا هەیە بۆ کەسانێک عەقڵ و ژیری خۆیان دەخەنەکار، (تا بیربکەنەوە چۆن لەم دارو درەختە ڕەق و تەقانە ئەم بەرهەمانە دروست دەبێت، چ کارخانەیەک لەناوکی خورما و ترێ و میوە جۆراو جۆرەکاندا حەشاردراوە تا لە باروداۆخی خۆیدا بکەوێتە کارو خزمەت بەئادەمیزاد بکات...هتد).

(٦٨) پەروەردگاری تۆ (ئەی ئینسان) ئیگاو ئیلهامی کردووە بۆ هەنگ کە جێگە بۆ خۆی سازبکات لەکون و کەلێنی چیاکاندا، هەروەها لە کەلەبەری درەختەکان و لەو شوێنانەش کە ئادەمیزاد بۆی ئامادە دەکات.

(٦٩) لەوەودوا (فێرمان کردووە کە) لە هەموو بەرو بووم و (شیلەی گوڵان و شتی بەسوود) بخوات و پێمان ڕاگەیاندووە: ئەو نەخشانەی کە پەروەردگارت بۆی کێشاویت بە ملکەچیەوە ئەنجامی بدە،(لە دروست کردنی شانەو مژینی شیلە و دروستکردنی هەنگوین و پووڕەدان بەدەوری شاژنداو بەخێوکردنی گەراکان..هتد)، جا لەناو سکی ئەو هەنگانەوە شلەیەکی ڕەنگ جیاواز دێتە دەرەوە کە شیفای تیادایە بۆ(زۆر نەخۆشی) خەڵکی (سەرەڕای تامی شیرین وخۆشی)، بەڕاستی ئالەمەشدا بەڵگەو نیشانەی بەهێز هەیە بۆ کەسانێک بیر بکەنەوە (سەرنج بدەن لە هەنگ و شانەکانی لە فڕین و هاتووچۆی، لە هەنگوین و تام و بۆن و ڕەنگی، لە...، لە.هتد).

(٧٠) (خەڵکینە) بەڕاستی هەر خوا دروستی کردوون و پاشان هەرئەویش دەتانمرێنێت، هەتانە تەمەنی درێژ دەبێت و دەبرێتەوە بۆ لاوازترین تەمەن (کەنەفتی و کەفتەکاری) تاوەکو دەگاتە ڕادەیەک کە دوای ئەو هەموو زانستی و زانیاری و تێگەیشتنەی کە هەی بوو، هەموو شتێکی لە بیر دەچێتەوە و هیچ نازانێت، بەڕاستی هەر خوا زانا و بەدەسەڵاتە.

(٧١) خوا لەبەخشینی رزق و ڕۆزیدا بەشی هەندێکتانی زۆرتردادوە لەهەندێکی ترتان (بۆ تاقیکردنەوەتان)، جا ئەوانەی کە رزق و ڕۆزی زیاتریان پێدراوە ئامادەنین کە بەندەکانیان و بەردەستەکانیان بهێننە ڕیزی خۆیان و بیانکەنە شەریک (لە خانوو بەرەو ماڵ و سامانیاندا)، ئینجا ئەوانیش یەکسان بن تیایدا (ئێوە لە ژیانی دنیای خۆتاندا کاری وا ناکەن و بەڕەوای نازانن، ئیتر چۆن بۆ خوای گەورە، بەڕەوای دەزانن کە بەندەکانی ببنە شەریکی و یاسادانەر) جا ئایا ئەوانە ئینکاری نازو نیعمەتەکانی خوا دەکەن؟!

(٧٢) خوا هەر لە خۆتان هاوسەرانی بۆ فەراهەم هێناون، هەر لە ڕێگەی هاوسەرانتانەوە کوڕو کوڕەزای پێبەخشیوون و لە هەموو رزق و ڕۆزیەکی چاک و پاک و بەسوود بەهرەوەری کردوون، (لەگەڵ ئەو ڕاستیانەدا) ئایا ئەوانە هەر بڕوا بەشتی پووچ و ناحەقی دەکەن و لە بەرامبەر نازو نیعمەتەکانی خواوە ئەوانە هەر ناشوکرو سوپاس ناپەزێری و بێباوەڕ دەبن؟

وَيَعْبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ مَا لَا يَمْلِكُ لَهُمْ رِزْقًا مِّنَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ شَيْـًٔا وَلَا يَسْتَطِيعُونَ ﴿٧٣﴾ فَلَا تَضْرِبُوا۟ لِلَّهِ ٱلْأَمْثَالَ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ يَعْلَمُ وَأَنتُمْ لَا تَعْلَمُونَ ﴿٧٤﴾ ۞ ضَرَبَ ٱللَّهُ مَثَلًا عَبْدًا مَّمْلُوكًا لَّا يَقْدِرُ عَلَىٰ شَىْءٍ وَمَن رَّزَقْنَٰهُ مِنَّا رِزْقًا حَسَنًا فَهُوَ يُنفِقُ مِنْهُ سِرًّا وَجَهْرًا ۖ هَلْ يَسْتَوُۥنَ ۚ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ ۚ بَلْ أَكْثَرُهُمْ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٧٥﴾ وَضَرَبَ ٱللَّهُ مَثَلًا رَّجُلَيْنِ أَحَدُهُمَآ أَبْكَمُ لَا يَقْدِرُ عَلَىٰ شَىْءٍ وَهُوَ كَلٌّ عَلَىٰ مَوْلَىٰهُ أَيْنَمَا يُوَجِّههُّ لَا يَأْتِ بِخَيْرٍ ۖ هَلْ يَسْتَوِى هُوَ وَمَن يَأْمُرُ بِٱلْعَدْلِ ۙ وَهُوَ عَلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ ﴿٧٦﴾ وَلِلَّهِ غَيْبُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۚ وَمَآ أَمْرُ ٱلسَّاعَةِ إِلَّا كَلَمْحِ ٱلْبَصَرِ أَوْ هُوَ أَقْرَبُ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ ﴿٧٧﴾ وَٱللَّهُ أَخْرَجَكُم مِّنۢ بُطُونِ أُمَّهَٰتِكُمْ لَا تَعْلَمُونَ شَيْـًٔا وَجَعَلَ لَكُمُ ٱلسَّمْعَ وَٱلْأَبْصَٰرَ وَٱلْأَفْـِٔدَةَ ۙ لَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ ﴿٧٨﴾ أَلَمْ يَرَوْا۟ إِلَى ٱلطَّيْرِ مُسَخَّرَٰتٍ فِى جَوِّ ٱلسَّمَآءِ مَا يُمْسِكُهُنَّ إِلَّا ٱللَّهُ ۗ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَٰتٍ لِّقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ ﴿٧٩﴾



(٧٣) ئەو (خەڵکە سەرگەردانە) شتێک دەپەرستن لە جیاتی خوا، کە هیچ جۆرە رزق و رۆزیەکی ئەوانی بەدەست نیە لە ئاسمانەکان و زەویدا، ناشتوانن هیچ بەدەست بن!!

(٧٤) کەوابوو ئێوە ئەی خوانەناسان نموونە مەهێننەوە بۆ خواو بەراوردی هەڵە مەکەن (دەیانوت پیاوانی پاشا خزمەتکاریان هەیە، پیاوانی پاشاش خزمەتکاری پاشان!!)، چونکە خوا خۆی هەموو شتێک چاک دەزانێت، بەڵام ئێوە نەزان و نەفامن.

(٧٥) خوا نموونەی هێناوەتەوە بەکەسێکی بەندە کە بێ دەسەڵاتە و هیچ شتێکی نیە، لە بەرامبەر ئەو کەسەدا کە لە رزق و رۆزی چاک و زۆر بەهرەوەرمان کردووە، بەئارەزووی خۆی لێی دەبەخشێت بەنهێنی و ئاشکرا، ئایا ئەو دوو کەسە وەک یەکن؟! سوپاس و ستایش بۆ خوا (کە پەروەردگارێکی کاربەجێیە) بەڵام زۆربەی ئەو خەڵکە نازانن و لەم راستیانە سەریان دەرناچێت (چونکە تەنها دنیا دەبینن).

(٧٦) هەروەها خوا نموونەی هێناوەتەوە بە دوو پیاو کە یەکێکیان لاڵ بێت و هیچی بۆ نەوترێت و هیچی بۆ نەکرێت و بووبێتە بار بەسەر هاوەڵ و کەس و کاریەوە، بۆ هەرچی و بۆ هەر کوێ رەوانە بکرێت خێر ناداتەوە، ئایا ئەو کەسە، وەکو ئەو کەسە وایە کە (بەوپەڕی ئازادیەوە)، فەرمان بە دادو دادپەروەری بدات و رێبازی راست و دروست دەگرێتە بەر؟!

(٧٧) هەرچی نهێنی و شاراوە هەیە لە ئاسمانەکان و زەویدا هەر بۆ خوایە و بەرپا بوونی قیامەت پێش نایەت وەک چاو تروکاندنێک نەبێت یان کەمتر لەوەش، بەڕاستی خوا دەسەڵاتی بەسەر هەموو شتێکدا هەیە.

(٧٨) خوا ئێوەی لە سکی دایکتان دەرهێناوە بێ ئەوەی هیچ شتێک بزانن، ئینجا دەزگای بیستن و بینین و تێگەیشتنی بۆ دابین کردوون، بۆ ئەوەی سوپاسگوزاری بکەن.

(٧٩) ئایا باڵندەکانیان نەبینوە و سەرنجیان نەداوە چۆن لە هەوای ئاسماندا بارهێنراون بۆ فڕین؟، کێ دەتوانێت رایانبگرێت بەئاسمانەوە جگە لە خوای گەورە (هەوا، چڕیەکەی زۆر کەمە، کەچی ئەم هەموو جۆرە باڵە فڕە تیایدا بە سەربەستی دەفڕێت، بێگومان ئەم رەحمەتەی خوا هەموو فڕۆکە و باڵە فڕێکی دەست کردی ئادەمیزادیشی گرتۆتەوە، کە لە بنەڕەتدا دەستکاری خوای باڵادەستن)، بەڕاستی ئا لەوەدا بەڵگە و نیشانەی زۆر هەن بۆ کەسانێک باوەڕ دەهێنن.

وَٱللَّهُ جَعَلَ لَكُم مِّنۢ بُيُوتِكُمۡ سَكَنٗا وَجَعَلَ لَكُم مِّن جُلُودِ ٱلۡأَنۡعَٰمِ بُيُوتٗا تَسۡتَخِفُّونَهَا يَوۡمَ ظَعۡنِكُمۡ وَيَوۡمَ إِقَامَتِكُمۡ وَمِنۡ أَصۡوَافِهَا وَأَوۡبَارِهَا وَأَشۡعَارِهَآ أَثَٰثٗا وَمَتَٰعًا إِلَىٰ حِينٖ ﴿٨٠﴾ وَٱللَّهُ جَعَلَ لَكُم مِّمَّا خَلَقَ ظِلَٰلٗا وَجَعَلَ لَكُم مِّنَ ٱلۡجِبَالِ أَكۡنَٰنٗا وَجَعَلَ لَكُمۡ سَرَٰبِيلَ تَقِيكُمُ ٱلۡحَرَّ وَسَرَٰبِيلَ تَقِيكُم بَأۡسَكُمۡۚ كَذَٰلِكَ يُتِمُّ نِعۡمَتَهُۥ عَلَيۡكُمۡ لَعَلَّكُمۡ تُسۡلِمُونَ ﴿٨١﴾ فَإِن تَوَلَّوۡاْ فَإِنَّمَا عَلَيۡكَ ٱلۡبَلَٰغُ ٱلۡمُبِينُ ﴿٨٢﴾ يَعۡرِفُونَ نِعۡمَتَ ٱللَّهِ ثُمَّ يُنكِرُونَهَا وَأَكۡثَرُهُمُ ٱلۡكَٰفِرُونَ ﴿٨٣﴾ وَيَوۡمَ نَبۡعَثُ مِن كُلِّ أُمَّةٖ شَهِيدٗا ثُمَّ لَا يُؤۡذَنُ لِلَّذِينَ كَفَرُواْ وَلَا هُمۡ يُسۡتَعۡتَبُونَ ﴿٨٤﴾ وَإِذَا رَءَا ٱلَّذِينَ ظَلَمُواْ ٱلۡعَذَابَ فَلَا يُخَفَّفُ عَنۡهُمۡ وَلَا هُمۡ يُنظَرُونَ ﴿٨٥﴾ وَإِذَا رَءَا ٱلَّذِينَ أَشۡرَكُواْ شُرَكَآءَهُمۡ قَالُواْ رَبَّنَا هَٰٓؤُلَآءِ شُرَكَآؤُنَا ٱلَّذِينَ كُنَّا نَدۡعُواْ مِن دُونِكَۖ فَأَلۡقَوۡاْ إِلَيۡهِمُ ٱلۡقَوۡلَ إِنَّكُمۡ لَكَٰذِبُونَ ﴿٨٦﴾ وَأَلۡقَوۡاْ إِلَى ٱللَّهِ يَوۡمَئِذٍ ٱلسَّلَمَۖ وَضَلَّ عَنۡهُم مَّا كَانُواْ يَفۡتَرُونَ ﴿٨٧﴾

(٨٠) هەر خوایە (کە هەموو شتێکی بۆ رەخساندوون تا ماڵ و خانووبەرە بۆ خۆتان دروست بکەن) ماڵەکانتانی بۆ کردوون بەهۆی ئارامگرتن و حەوانەوە و لە پێست و مووی ماڵاتیش دەتوانن شوێن و جێگە بۆ خۆتان بسازێنن، پاشان بەئاسانی بیگوێزنەوە لەکاتی کۆچتاندا، بەئاسانی هەڵی بدەن لە کاتی نیشتەجێ بوونتاندا و لە خوری و کوڵک و مووەکەی، دەتوانن کەل و پەل و شتومەک بۆ خۆتان دروست بکەن و تاماوەیەک سوودیان لێ وەربگرن.

(٨١) خوا لەو شتانەی کە دروستی کردووە سێبەری بۆ ئێوە رەخساندووە، لە کێوەکانیشدا کون و کەلێن و ئەشکەوتی سازاندووە و پۆشاکی بۆتان بەدیهێناوە تا لە گەرما و (سەرما) بتانپارێزێت، هەروەها جۆرەها پۆشاکی تر بۆ بەدیهێناون بۆ پاراستنی گیانتان لەکاتی جەنگ و شەڕو شۆڕدا (وەکو زرێ و شتومەکی تر)، ئا بەو شێوەیە پەروەردگارتان نازو نیعمەتی خۆیتان بەتەواوی بەسەردا دەڕژێنێت بۆ ئەوەی ملکەچ و فەرمانبەردار بن.

(٨٢) (لەگەڵ ئەم هەموو بەڵگەو نازو نیعمەتانەدا) ئەگەر ئەوانە هەر پشتیان هەڵبکەن و روو وەربگێڕن (ئەوە خەمت نەبێت هەر خۆیان زەرەر دەکەن) چونکە بەڕاستی ئەرکی سەرشانی تۆ ئەوەیە کە بە جوانی و تێرو تەواوی بانگەوازەکە بگەیەنیت.

(٨٣) (بێسەلیقە و نەفامان) نازو نیعمەتەکانی خوا دەناسن و بەهرەی لێ دەبەن، پاشان ئینکاری دەکەن و قەدری نازانن (بەدنمەک و سپڵەن)، زۆربەیان بێدین و بێ باوەڕن.

(٨٤) رۆژێک دێت لە هەر گەل و نەتەوەیەکدا پێغەمبەرێک بۆ شایەتی دەهێنینە مەیدان، لەوەودوا بەهیچ جۆرێک مۆڵەت بەوانە نادرێت کە بێباوەڕ بوون و پاکانەیان لێ وەرناگیرێت.

(٨٥) کاتێک ستەمکاران سزای سەختی دۆزەخ دەبینن (داوای سووک کردنی دەکەن) ئەوە سووک ناکرێت لەسەریان، هیچ جۆرە مۆڵەتێکیشیان نادرێت.

(٨٦) (لەناو دۆزەخدا) کاتێکیش ئەوانەی کە هاوەڵیان داناوە، بتەکان و ئەو کەس و شتانە دەبینن کە جاران دەیانپەرست، ئەوە دەڵێن: پەروەردگارا ئا ئەوانە، ئەو شتانەن کە لە جیاتی تۆ هاناو هاوارمان بۆ دەبردن لەجیاتی تۆ، ئەوانیش قسەکە دەدەنەوە بەسەریاندا و دەڵێن: بەڕاستی ئێوە درۆ دەکەن و راست ناکەن.

(٨٧) ئەو رۆژە هەموویان خۆیان تەسلیمی خوا کرد بە ملکەچی و زەلیلی، هەرچیش هەڵیاندەبەست و ئومێدیان پێی بوو لێیان بزر بوو (ئیتر بۆ هەمیشە هەناسە ساردو ریسوان).

ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ وَصَدُّواْ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ زِدۡنَٰهُمۡ عَذَابٗا فَوۡقَ ٱلۡعَذَابِ بِمَا كَانُواْ يُفۡسِدُونَ ﴿٨٨﴾ وَيَوۡمَ نَبۡعَثُ فِي كُلِّ أُمَّةٖ شَهِيدًا عَلَيۡهِم مِّنۡ أَنفُسِهِمۡۖ وَجِئۡنَا بِكَ شَهِيدًا عَلَىٰ هَٰٓؤُلَآءِۚ وَنَزَّلۡنَا عَلَيۡكَ ٱلۡكِتَٰبَ تِبۡيَٰنٗا لِّكُلِّ شَيۡءٖ وَهُدٗى وَرَحۡمَةٗ وَبُشۡرَىٰ لِلۡمُسۡلِمِينَ ﴿٨٩﴾ ۞إِنَّ ٱللَّهَ يَأۡمُرُ بِٱلۡعَدۡلِ وَٱلۡإِحۡسَٰنِ وَإِيتَآيِٕ ذِي ٱلۡقُرۡبَىٰ وَيَنۡهَىٰ عَنِ ٱلۡفَحۡشَآءِ وَٱلۡمُنكَرِ وَٱلۡبَغۡيِۚ يَعِظُكُمۡ لَعَلَّكُمۡ تَذَكَّرُونَ ﴿٩٠﴾ وَأَوۡفُواْ بِعَهۡدِ ٱللَّهِ إِذَا عَٰهَدتُّمۡ وَلَا تَنقُضُواْ ٱلۡأَيۡمَٰنَ بَعۡدَ تَوۡكِيدِهَا وَقَدۡ جَعَلۡتُمُ ٱللَّهَ عَلَيۡكُمۡ كَفِيلًاۚ إِنَّ ٱللَّهَ يَعۡلَمُ مَا تَفۡعَلُونَ ﴿٩١﴾ وَلَا تَكُونُواْ كَٱلَّتِي نَقَضَتۡ غَزۡلَهَا مِنۢ بَعۡدِ قُوَّةٍ أَنكَٰثٗا تَتَّخِذُونَ أَيۡمَٰنَكُمۡ دَخَلَۢا بَيۡنَكُمۡ أَن تَكُونَ أُمَّةٌ هِيَ أَرۡبَىٰ مِنۡ أُمَّةٍۚ إِنَّمَا يَبۡلُوكُمُ ٱللَّهُ بِهِۦۚ وَلَيُبَيِّنَنَّ لَكُمۡ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ مَا كُنتُمۡ فِيهِ تَخۡتَلِفُونَ ﴿٩٢﴾ وَلَوۡ شَآءَ ٱللَّهُ لَجَعَلَكُمۡ أُمَّةٗ وَٰحِدَةٗ وَلَٰكِن يُضِلُّ مَن يَشَآءُ وَيَهۡدِي مَن يَشَآءُۚ وَلَتُسۡـَٔلُنَّ عَمَّا كُنتُمۡ تَعۡمَلُونَ ﴿٩٣﴾



(٨٨) ئەوانەی کە بێ باوەڕ بوون و بەربەستیان دەخستە سەر ڕێبازی خواو کۆسپیان دادەنا لە بەردەم ئاینی خوادا، سزامان لەسەریەک بۆ کەڵەکە کردن، بەهۆی ئەوەوە کە زۆر هەوڵ و کۆششیان دەدا بۆ بڵاوکردنەوەی فەسادو تاوان و خراپە (لەناو خەڵکیدا).

(٨٩) ڕۆژێک دێت لە هەموو ئوممەتێکدا شایەتێک دەنێرین لە خۆیان بۆ سەریان، تۆشمان هێناوە (ئەی محمد ﷺ) کە شایەت بیت لەسەر ئەو خەڵکە، قورئانیشمان بۆ تۆ دابەزاندووە، ڕوونکەرەوەی هەموو شتێکە، هیدایەت بەخش و ڕەحمەتە و مزگێنیشە بۆ موسڵمانان.

(٩٠) بەڕاستی خوا فەرمان دەدات بە دادپەروەری و چاکەکاری و یارمەتیدان و بەخشندەیی بە خزمان و قەدەغە لە گوناهو تاوان و دەستدرێژی دەکات (بۆ سەر ماڵ و نەفس و ناموس) و ئامۆژگاریتان دەکات بۆ ئەوەی یاداوەری وەربگرن و تێفکرن و (هەر چاکە بکەن).

(٩١) بە وەفاو بە ئەمەک بن بۆ ئەنجامدانی پەیمانی خوا کاتێک بڕیاری دەدەن و سوێند و پەیمان و بەڵێنتان هەڵمەوەشێننەوە دوای ئەوەی کە دوویات کرابۆوە و تەئکیدی لەسەر کرابوو، لەکاتێکدا کە ئێوە خواتان کردۆتە کەفیل و زامن بەسەر خۆتانەوە، بێگومان خوا دەزانێت بەو کارو کردەوانەی کە دەیکەن.

(٩٢) (کاتێک بەڵێن و پەیمانێک دەدەن ئەمەک و وەفاتان هەبێت بۆ ئەنجامدانی) وەکو ئەو ئافرەتە مەبن کە ڕیسەکەی دەکردەوە بەخوری، دوای ڕستن و تۆکمەکردنی هەڵی دەوەشاندەوە، لەکاتێکدا ئێوەش بەڵێن و سوێندو پەیمانتان بکەنە هۆی فێڵ و تەڵەکە لە نێوانتاندا، ئەوەکو دەستەو کۆمەڵێکی ژمارە زۆرو دەسەڵاتدار پەلاماری دەستەیەکی تری کەم دەست و لاولز بدات، بێگومان خوا بەو جۆرە شتانە تاقیتان دەکاتەوە، سوێند بەخوا هەموو ئەو شتانەتان بۆ ڕوون دەکاتەوە کە جیاوازی و کێشەتان تێدا هەبوو.

(٩٣) خۆ ئەگەر خوا بیویستایە دەیکردن بەیەک ئوممەت (بەڵکو ڕێزی بۆ داناون و مۆڵەتی داون و سەربەستی کردوون)، بەڵام ئەوەی خوا بیەوێت گومڕای دەکات و ئەوەی بیەوێت ڕێنموویی دەکات (ئەڵبەتە ویستی خوا دژایەتی ویستی ئادەمیزاد ناکات، ئەوەی بیەوێت ڕێبازی هیدایەت بگرێت ڕێنموویی دەکات، ئەوەش ڕێبازی گومڕایی بگرێتە بەر مۆڵەتی دەدات و زۆری لێ ناکات)، بێگومان پرسیارتان لێ دەکرێت دەربارەی ئەو کارو کردەوانەی کە ئەنجامتان دەدا.

وَلَا تَتَّخِذُوٓا۟ أَيْمَـٰنَكُمْ دَخَلًۢا بَيْنَكُمْ فَتَزِلَّ قَدَمٌۢ بَعْدَ ثُبُوتِهَا وَتَذُوقُوا۟ ٱلسُّوٓءَ بِمَا صَدَدتُّمْ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ ۖ وَلَكُمْ عَذَابٌ عَظِيمٌ ﴿٩٤﴾ وَلَا تَشْتَرُوا۟ بِعَهْدِ ٱللَّهِ ثَمَنًا قَلِيلًا ۚ إِنَّمَا عِندَ ٱللَّهِ هُوَ خَيْرٌ لَّكُمْ إِن كُنتُمْ تَعْلَمُونَ ﴿٩٥﴾ مَا عِندَكُمْ يَنفَدُ ۖ وَمَا عِندَ ٱللَّهِ بَاقٍ ۗ وَلَنَجْزِيَنَّ ٱلَّذِينَ صَبَرُوٓا۟ أَجْرَهُم بِأَحْسَنِ مَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴿٩٦﴾ مَنْ عَمِلَ صَـٰلِحًا مِّن ذَكَرٍ أَوْ أُنثَىٰ وَهُوَ مُؤْمِنٌ فَلَنُحْيِيَنَّهُۥ حَيَوٰةً طَيِّبَةً ۖ وَلَنَجْزِيَنَّهُمْ أَجْرَهُم بِأَحْسَنِ مَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴿٩٧﴾ فَإِذَا قَرَأْتَ ٱلْقُرْءَانَ فَٱسْتَعِذْ بِٱللَّهِ مِنَ ٱلشَّيْطَـٰنِ ٱلرَّجِيمِ ﴿٩٨﴾ إِنَّهُۥ لَيْسَ لَهُۥ سُلْطَـٰنٌ عَلَى ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَلَىٰ رَبِّهِمْ يَتَوَكَّلُونَ ﴿٩٩﴾ إِنَّمَا سُلْطَـٰنُهُۥ عَلَى ٱلَّذِينَ يَتَوَلَّوْنَهُۥ وَٱلَّذِينَ هُم بِهِۦ مُشْرِكُونَ ﴿١٠٠﴾ وَإِذَا بَدَّلْنَآ ءَايَةً مَّكَانَ ءَايَةٍ ۙ وَٱللَّهُ أَعْلَمُ بِمَا يُنَزِّلُ قَالُوٓا۟ إِنَّمَآ أَنتَ مُفْتَرٍۭ ۚ بَلْ أَكْثَرُهُمْ لَا يَعْلَمُونَ ﴿١٠١﴾ قُلْ نَزَّلَهُۥ رُوحُ ٱلْقُدُسِ مِن رَّبِّكَ بِٱلْحَقِّ لِيُثَبِّتَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَهُدًى وَبُشْرَىٰ لِلْمُسْلِمِينَ ﴿١٠٢﴾

(٩٤) نەكەن پەیمان و سوێندەكانتان بكەنە هۆی پیلان گێران و فێڵ و تەڵەكە لە نێوانتاندا، (ئەو بڕیارو پەیمانانە هەڵنەوەشێت) تا پێ هەڵنەخلیسكێت دوای ئەوەی كە قایم وەستابوو، تاڵاوی ناخۆش نەچێژن كاتێك بەهۆی ئەو كارەتانەوە بەربەست دەخەنە بەردەم ڕێبازی خوا، (ئەگەر وابكەن) ئەوكاتە سزایەكی گەورەتان بۆ هەیە.

(٩٥) (پەیمانی خوا مەشكێنن) و بە هەڵوەشاندنەوەی بەنرخێكی كەم مەیگۆڕن، (ئەو نرخە هەرچەند بێ هەر كەمە) چونكە بێگومان ئەو بەشەی لای خوایە لە بەهەشتدا هەر ئەوە چاكترە بۆتان ئەگەر بزانن و تێبگەن.

(٩٦) ئەوەی لای ئێوەیە و بەئێوە بەخشراوە، تەواو دەبێت، بەڵام ئەوەی لای خوایە و (لە پێناوی ئەودا دەیبەخشن) هەر دەمێنێتەوە، (كە پاداشتی بەهەشتی بەرین و نەبڕاوەیە) سوێند بەخوا بێگومان پاداشتی ئەوانەی كە خۆگرو ئارامگر بوون بەجوانتر دەدەینەوە لەوەی كە ئەوان دەیانكرد.

(٩٧) ئەوەی كارو كردەوەی چاكەی كردبێت، پیاو بێت یان ئافرەت، لەكاتێكدا بڕوادار بێت، سوێند بە خوا بەژیانێكی كامەران و ئاسوودە لە دنیادا دەیژێنین، لە قیامەتیشدا پاداشتیان بەجوانتر دەدەینەوە لەوەی كە ئەوان دەیانكرد.

(٩٨) ئینجا كاتێك قورئانت خوێندو دەورت كردەوە، ئەوە پەنا بگرە بەخوا لە شەیتانی نەفرین لێكراو.

(٩٩) بێگومان شەیتان دەسەڵاتی نیە بەسەر ئەوانەدا كە باوەڕیان هێناوە و پشت بە پەروەردگاریان دەبەستن...

(١٠٠) بەڕاستی تەنها دەسەڵاتی بەسەر ئەوانەدا هەیە كە پشتیان پێ بەستووە و ملكەچ و فەرمانبەرداری ئەو دەبن، هەروەها ئەوانەش كە هاوەڵگەرن بۆ پەروەردگار.

(١٠١) كاتێكیش ئایەتێك دەخەینە جێی ئایەتێكی تر (بۆ ئەوەی پلە بە پلە شتێك حەرام بكەین، یان دیاردەیەكی نەفامی لابەرین) خوایش خۆی دەزانێت چی دادەبەزێنێت و چ فەرمانێك دەدات، ئەوە نەفامان دەڵێن: (ئەی محمد ﷺ) بێگومان تۆ هەر لە خۆتەوە شت هەڵدەبەستیت، نەخێر وا نیە، (ئەو لە خۆیەوە شت نالێت) بەڵكو زۆربەی ئەو نەفامانە تێناگەن و نازانن.

(١٠٢) ئەی محمد ﷺ پێیان بڵێ: روح القدس، (جوبرەئیل، ئەم قورئانەی) لەلایەن پەروەردگارتەوە بە حەق و ڕاستی دابەزاندووە، بۆ ئەوەی ئەوانەی باوەڕیان هێناوە دامەزراو پایەدار بكات و ڕێنموویی و مژدەشە بۆ موسڵمانان.

وَلَقَدْ نَعْلَمُ أَنَّهُمْ يَقُولُونَ إِنَّمَا يُعَلِّمُهُ بَشَرٌ لِّسَانُ الَّذِي يُلْحِدُونَ إِلَيْهِ أَعْجَمِيٌّ وَهَٰذَا لِسَانٌ عَرَبِيٌّ مُّبِينٌ ﴿١٠٣﴾ إِنَّ الَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ بِآيَاتِ اللَّهِ لَا يَهْدِيهِمُ اللَّهُ وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿١٠٤﴾ إِنَّمَا يَفْتَرِي الْكَذِبَ الَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ بِآيَاتِ اللَّهِ وَأُولَٰئِكَ هُمُ الْكَاذِبُونَ ﴿١٠٥﴾ مَن كَفَرَ بِاللَّهِ مِن بَعْدِ إِيمَانِهِ إِلَّا مَنْ أُكْرِهَ وَقَلْبُهُ مُطْمَئِنٌّ بِالْإِيمَانِ وَلَٰكِن مَّن شَرَحَ بِالْكُفْرِ صَدْرًا فَعَلَيْهِمْ غَضَبٌ مِّنَ اللَّهِ وَلَهُمْ عَذَابٌ عَظِيمٌ ﴿١٠٦﴾ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمُ اسْتَحَبُّوا الْحَيَاةَ الدُّنْيَا عَلَى الْآخِرَةِ وَأَنَّ اللَّهَ لَا يَهْدِي الْقَوْمَ الْكَافِرِينَ ﴿١٠٧﴾ أُولَٰئِكَ الَّذِينَ طَبَعَ اللَّهُ عَلَىٰ قُلُوبِهِمْ وَسَمْعِهِمْ وَأَبْصَارِهِمْ وَأُولَٰئِكَ هُمُ الْغَافِلُونَ ﴿١٠٨﴾ لَا جَرَمَ أَنَّهُمْ فِي الْآخِرَةِ هُمُ الْخَاسِرُونَ ﴿١٠٩﴾ ثُمَّ إِنَّ رَبَّكَ لِلَّذِينَ هَاجَرُوا مِن بَعْدِ مَا فُتِنُوا ثُمَّ جَاهَدُوا وَصَبَرُوا إِنَّ رَبَّكَ مِن بَعْدِهَا لَغَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿١١٠﴾

(١٠٣) سوێند بەخوا ئێمە بەڕاستی دەزانین بێباوەڕان دەڵێن: ئەم قورئانە تەنها کەسێک فێری دەکات، (بەمەرجێک) زمانی ئەو کەسەی ئەوان دەڵێن قورئان فێری محمد دەکات، عەجەمیە و عەرەبی نیە و ڕەوان نیە، لەگەڵ ئەوەدا ئەم قورئانە بەزمانی عەرەبی پاراو و ڕوون و ئاشکرا داڕێژراوە.

(١٠٤) بەڕاستی ئەوانەی کە بڕوایان بە ئایەتەکانی خوا نیە، خوای گەورە هیدایەت و ڕێنموویان ناکات، بەڵکو سزای بە ئێشی بۆ ئامادە کردوون.

(١٠٥) بێگومان هەر ئەوانە درۆ هەڵدەبەستن کە باوەڕیان بە ئایەتەکانی خوا نیە، هەر ئەوانیش درۆزنن و درۆیان کردۆتە پیشە.

(١٠٦) ئەوەی پاشگەز بێتەوە لە خواناسی، دوای باوەڕهێنانی، جگە لەوانەی کە ناچار دەکرێن وشەی کوفر بێت بەسەر زاریاندا لە کاتێکدا دڵیان پڕە لە ئیمان، بەڵام ئەو کەسەی دڵی بە کوفرو بێ دینی خۆش کردبێت، ئەوانە خەشم و قینی خوایان لەسەرەو سزای گەورە و سەخت و دژواریان بۆ هەیە.

(١٠٧) ئەو خەشم و قینەش لەبەر ئەوەیە چونکە بەڕاستی ئەوانە ژیانی دنیایان خۆش ویستووە تا ژیانی دواڕۆژ، بێگومان خوا هیدایەتی قەوم و کەسانی بێ باوەڕ و خوانەناس نادات.

(١٠٨) ئەو جۆرە کەسانە، ئەوانەن کە خوا مۆری ناوە بەسەر دڵ و دەروون و دەزگای بیستن و بینینیاندا و ئەوانە غافڵ و بێ ئاگان (لە حەقیقەت و ڕاستیەکان).

(١٠٩) شتێکی ڕاستەو گومانی تێدانیە ئەوان لە ڕۆژی قیامەتدا خەسارەتمەند و ڕیسوا و زەرەرمەندن.

(١١٠) پاشان بێگومان (ئەی محمدﷺ) پەروەردگاری تۆ بەنیسبەتی ئەوانەوە کە کۆچیان کرد، دوای ئەوەی ئازارو ئەشکەنجەدران، لەوەودوا جیهاد و کۆشش خۆگرییان بەردەوام بوو، بەڕاستی پەروەردگارت دوای ئەو پێشهاتانە زۆر لێخۆش بوو میهرەبانە (بەرامبەر ئەو ئیماندارانە).



۞ يَوْمَ تَأْتِي كُلُّ نَفْسٍ تُجَادِلُ عَن نَّفْسِهَا وَتُوَفَّىٰ كُلُّ نَفْسٍ مَّا عَمِلَتْ وَهُمْ لَا يُظْلَمُونَ ﴿١١١﴾ وَضَرَبَ اللَّهُ مَثَلًا قَرْيَةً كَانَتْ آمِنَةً مُّطْمَئِنَّةً يَأْتِيهَا رِزْقُهَا رَغَدًا مِّن كُلِّ مَكَانٍ فَكَفَرَتْ بِأَنْعُمِ اللَّهِ فَأَذَاقَهَا اللَّهُ لِبَاسَ الْجُوعِ وَالْخَوْفِ بِمَا كَانُوا يَصْنَعُونَ ﴿١١٢﴾ وَلَقَدْ جَاءَهُمْ رَسُولٌ مِّنْهُمْ فَكَذَّبُوهُ فَأَخَذَهُمُ الْعَذَابُ وَهُمْ ظَالِمُونَ ﴿١١٣﴾ فَكُلُوا مِمَّا رَزَقَكُمُ اللَّهُ حَلَالًا طَيِّبًا وَاشْكُرُوا نِعْمَتَ اللَّهِ إِن كُنتُمْ إِيَّاهُ تَعْبُدُونَ ﴿١١٤﴾ إِنَّمَا حَرَّمَ عَلَيْكُمُ الْمَيْتَةَ وَالدَّمَ وَلَحْمَ الْخِنزِيرِ وَمَا أُهِلَّ لِغَيْرِ اللَّهِ بِهِ ۖ فَمَنِ اضْطُرَّ غَيْرَ بَاغٍ وَلَا عَادٍ فَإِنَّ اللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿١١٥﴾ وَلَا تَقُولُوا لِمَا تَصِفُ أَلْسِنَتُكُمُ الْكَذِبَ هَٰذَا حَلَالٌ وَهَٰذَا حَرَامٌ لِّتَفْتَرُوا عَلَى اللَّهِ الْكَذِبَ ۚ إِنَّ الَّذِينَ يَفْتَرُونَ عَلَى اللَّهِ الْكَذِبَ لَا يُفْلِحُونَ ﴿١١٦﴾ مَتَاعٌ قَلِيلٌ وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿١١٧﴾ وَعَلَى الَّذِينَ هَادُوا حَرَّمْنَا مَا قَصَصْنَا عَلَيْكَ مِن قَبْلُ ۖ وَمَا ظَلَمْنَاهُمْ وَلَٰكِن كَانُوا أَنفُسَهُمْ يَظْلِمُونَ ﴿١١٨﴾

(١١١) رۆژێک دێت کە هەموو کەس خەمی خۆیەتی، بەرگری لە خۆی دەکات، پاکانە بۆ خۆی دەکات، (گوێ بەکەسی تر نادات، ئەو رۆژە) هەرکەس پاداشتی کردەوەکانی دەدرێتەوە و ئەو خەڵکە ستەمیان لێ ناکرێت.

(١١٢) خوا نموونەی هێناوەتەوە (بە دانیشتوانی) شارێک کە ژیانیان بە هێمنی و ئاسوودەیی دەبردە سەر، لە هەموو لایەکەوە رزق و رۆزی جۆراو جۆریان بۆ دەهات (بەڵام لە جیاتی سوپاسگوزاریی) ناشوکرو قەدرنەزانی نازو نیعمەتەکانی خوا بوون، ئینجا خوای گەورە پۆشاکی برسێتی و ترسی کردە کاڵای باڵایان و تاڵاوی نەداریی و ترسی پێ چەشتن لە سەر ئەنجامی ئەو نیش و کارە (ناپوخت و نارێکانەدا) کە دەیانکردە پیشەی خۆیان.

(١١٣) سوێند بەخوا بەڕاستی ئەوانە پێغەمبەرێکیان هەر لە خۆیان بۆ هات، کەچی بەدرۆیان زانی و بڕوایان پێنەکرد، ئەوسا سزای سەختی خوایی گرتنی و لەناوی بردن لەکاتێکدا ئەوان ستەمکار بوون.

(١١٤) جا ئێوە ئەی ئیمانداران بخۆن لەو رزق و رۆزیەی حەڵاڵ و پاکەی کە خوا پێی بەخشیوون، هەمیشە شوکر و سوپاسی نازو نیعمەتی خوا بکەن، ئەگەر ئێوە تەنها ئەو زاتە دەپەرستن.

(١١٥) (خوای پەروەردگار) تەنها مردارەوە بوو و، خوێن و، گۆشتی بەراز و، ئەو ماڵاتانەی کە ناوی غەیری خوایان لەکاتی سەربڕیندا لەسەر هێنراوە، حەرامی کردووە لێتان، جا ئەگەر کەسێک پێویستی ناچاری کرد بە خواردنیان بێ زیادەڕەوی و لە سنوور دەرچوون، ئەوە بەڕاستی خوا زۆر لێخۆشبوو بە بەزەیی و دلۆڤانە.

(١١٦) نەکەن بەقاڵەی دەم و زمانتان بڵێن ئەمە حەڵاڵە و ئەمە حەرامە، بۆ ئەوەی درۆ بەناوی خواو ئاینی خواوە هەڵبەستن، (دیاری کردنی حەڵاڵ و حەرام بەدەست ئێوە نیە، چونکە) بەڕاستی ئەوانەی درۆ بۆ خواو ئاینی خوا هەڵدەبەستن سەرفرازو سەرکەوتوو نابن.

(١١٧) (ئەوانە لە دنیادا) کەمێک رادەبوێرن، بەڵام لە قیامەتدا سزای بەئێش و ئازاریان بۆ ئامادەیە.

(١١٨) لەسەر ئەوانەش کە بوونەتە جوو، هەموو ئەو شتانەمان لەسەر حەرام کردوون کە پێشتر بۆ تۆمان باس کردووە (لە ئایەتی ١٤٦ سوورەتی الانعام دا) جا وەنەبێت ئێمە ستەممان لێکردبن بەڵکو هەر خۆیان ستەمیان لە خۆیان دەکرد.

ثُمَّ إِنَّ رَبَّكَ لِلَّذِينَ عَمِلُواْ ٱلسُّوٓءَ بِجَهَٰلَةٖ ثُمَّ تَابُواْ مِنۢ
بَعۡدِ ذَٰلِكَ وَأَصۡلَحُوٓاْ إِنَّ رَبَّكَ مِنۢ بَعۡدِهَا لَغَفُورٞ رَّحِيمٌ ﴿١١٩﴾
إِنَّ إِبۡرَٰهِيمَ كَانَ أُمَّةٗ قَانِتٗا لِّلَّهِ حَنِيفٗا وَلَمۡ يَكُ مِنَ ٱلۡمُشۡرِكِينَ
﴿١٢٠﴾ شَاكِرٗا لِّأَنۡعُمِهِۚ ٱجۡتَبَىٰهُ وَهَدَىٰهُ إِلَىٰ صِرَٰطٖ مُّسۡتَقِيمٖ
﴿١٢١﴾ وَءَاتَيۡنَٰهُ فِي ٱلدُّنۡيَا حَسَنَةٗۖ وَإِنَّهُۥ فِي ٱلۡأٓخِرَةِ لَمِنَ ٱلصَّٰلِحِينَ
﴿١٢٢﴾ ثُمَّ أَوۡحَيۡنَآ إِلَيۡكَ أَنِ ٱتَّبِعۡ مِلَّةَ إِبۡرَٰهِيمَ حَنِيفٗاۖ وَمَا كَانَ
مِنَ ٱلۡمُشۡرِكِينَ ﴿١٢٣﴾ إِنَّمَا جُعِلَ ٱلسَّبۡتُ عَلَى ٱلَّذِينَ
ٱخۡتَلَفُواْ فِيهِۚ وَإِنَّ رَبَّكَ لَيَحۡكُمُ بَيۡنَهُمۡ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ فِيمَا
كَانُواْ فِيهِ يَخۡتَلِفُونَ ﴿١٢٤﴾ ٱدۡعُ إِلَىٰ سَبِيلِ رَبِّكَ بِٱلۡحِكۡمَةِ
وَٱلۡمَوۡعِظَةِ ٱلۡحَسَنَةِۖ وَجَٰدِلۡهُم بِٱلَّتِي هِيَ أَحۡسَنُۚ إِنَّ رَبَّكَ
هُوَ أَعۡلَمُ بِمَن ضَلَّ عَن سَبِيلِهِۦۖ وَهُوَ أَعۡلَمُ بِٱلۡمُهۡتَدِينَ ﴿١٢٥﴾
وَإِنۡ عَاقَبۡتُمۡ فَعَاقِبُواْ بِمِثۡلِ مَا عُوقِبۡتُم بِهِۦۖ وَلَئِن صَبَرۡتُمۡ
لَهُوَ خَيۡرٞ لِّلصَّٰبِرِينَ ﴿١٢٦﴾ وَٱصۡبِرۡ وَمَا صَبۡرُكَ إِلَّا بِٱللَّهِۚ
وَلَا تَحۡزَنۡ عَلَيۡهِمۡ وَلَا تَكُ فِي ضَيۡقٖ مِّمَّا يَمۡكُرُونَ
﴿١٢٧﴾ إِنَّ ٱللَّهَ مَعَ ٱلَّذِينَ ٱتَّقَواْ وَّٱلَّذِينَ هُم مُّحۡسِنُونَ ﴿١٢٨﴾

(١١٩) پاشان، بەڕاستی پەروەردگاری تۆ بۆ کەسانێک کە گوناهو تاوانیان ئەنجامداوە بە نەفامی، لەوەودوا پەشیمان بونەتەوە و تەوبەیان کردووە و چاکسازیان ئەنجامداوە، بێگومان پەروەردگاری تۆ دوای ئەو تەوبە و چاکەکاریە زۆر لێخۆشبوو میهرەبانە.

(١٢٠) بەڕاستی ئیبراهیم ﷺ هەر خۆی ئومەتێک بوو، (هەر خۆی پێشەوایەک بوو) ملکەچ و فەرمانبەرداری خوا بوو و لە هەموو بیروباوەڕێکی چەوت بەدوور بوو، لە موشریک و هاوەڵگەرانیش نەبوو...

(١٢١) هەروەها زۆر سوپاسگوزاری خوا بوو لە بەرامبەر نازو نیعمەتی بێ شوماری پەروەردگاریەوە، ئەویش هەڵی بژاردو ڕێنموویی کرد بۆ ڕێبازی ڕاست و دروست.

(١٢٢) ئێمە هەر لە دنیادا چاکەمان پێبەخشی و پاداشتی چاکەمان دایەوە (بە بەخشینی هاوسەری پاک و نەوەی خواناس) بەڕاستی ئەو لە جیهانی داهاتوودا لە ڕیزی چاکاندایە (کە ڕێزدارو بەختەوەر و کامەرانن).

(١٢٣) لەوەودوا (دوای چەندەها سەدە) وەحی و نیگامان بۆ تۆ (ئەی محمد ﷺ) نارد کە شوێنی ئاین و بەرنامەی ئیبراهیم بکەویت کە بە دوور بووە لە هەموو بیرو باوەڕێکی چەوت، ئەو لە دەستەی موشریک و هاوەڵگەران نەبووە.

(١٢٤) بەڕاستی قەدەغەکردنی کاروباری دنیایی لە ڕۆژانی شەمموواندا تەنها لەسەر ئەوانە بڕیار درا کە کێشەیان هەبوو تیایدا، بێگومان پەروەرگاری تۆ فەرمانڕەوایی دەکات لە نێوانیاندا لە ڕۆژی قیامەتدا لەسەر ئەو شتانەی کە ئەوان کێشە و جیاوازیان تێدا دەکرد.

(١٢٥) (ئەی پێغەمبەر ﷺ، ئەی ئیماندار) بانگەواز بکە بۆ لای بەرنامە و ڕێبازی پەروەردگارت بەحیکمەت و دانایی (بۆ هەندێک)و ئامۆژگاری جوان و بەجێ، (بۆ هەندێکی تر)و گفتوگۆ و موجادەلە بەجوانترین شێوە (لەگەڵ هەندێکی تردا بە تایبەتی خاوەن کتێبەکان)، چونکە بەڕاستی پەروەردگارت هەر خۆی زانایە، کە کێ گومڕایە، هەروەها هەر خۆیشی زانایە بەهیدایەت وەرگران.

(١٢٦) ئەگەر ویستتان تۆڵە بکەنەوە، دەبێت هەر بەقەدەر ئەو ستەمەی کە لێتان کراوە تۆڵە بکەنەوە، خۆ ئەگەر ئارام گرو خۆگر بن، ئەوە چاکترە بۆ ئارامگرو خۆگران.

(١٢٧) (ئەی پێغەمبەر ﷺ، ئەی ئیماندار) خۆگرو ئارامگربە و خۆگری و ئارامگریەکەشت تەنها بەکۆمەکی و یارمەتی خوا دەبێت بەکەسی تر ناکرێت، خەفەتیش مەخۆ لە خوانەناسان کە باوەڕ ناهێنن و دڵتەنگ مەبە لە بەرامبەر ئەو پیلان و نەخشانەی کە دوژمنان دەیگێڕن.

(١٢٨) چونکە بەڕاستی خوا لەگەڵ ئەو کەسانەدایە کە خۆیان پاراستووە لەگوناه و هەروەها ئەوانەش کە چاکەکارو چاکەخوازن.



بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

سُبْحَٰنَ ٱلَّذِىٓ أَسْرَىٰ بِعَبْدِهِۦ لَيْلًا مِّنَ ٱلْمَسْجِدِ ٱلْحَرَامِ إِلَى ٱلْمَسْجِدِ ٱلْأَقْصَا ٱلَّذِى بَٰرَكْنَا حَوْلَهُۥ لِنُرِيَهُۥ مِنْ ءَايَٰتِنَآ ۚ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْبَصِيرُ ﴿١﴾ وَءَاتَيْنَا مُوسَى ٱلْكِتَٰبَ وَجَعَلْنَٰهُ هُدًى لِّبَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ أَلَّا تَتَّخِذُوا۟ مِن دُونِى وَكِيلًا ﴿٢﴾ ذُرِّيَّةَ مَنْ حَمَلْنَا مَعَ نُوحٍ ۚ إِنَّهُۥ كَانَ عَبْدًا شَكُورًا ﴿٣﴾ وَقَضَيْنَآ إِلَىٰ بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ فِى ٱلْكِتَٰبِ لَتُفْسِدُنَّ فِى ٱلْأَرْضِ مَرَّتَيْنِ وَلَتَعْلُنَّ عُلُوًّا كَبِيرًا ﴿٤﴾ فَإِذَا جَآءَ وَعْدُ أُولَىٰهُمَا بَعَثْنَا عَلَيْكُمْ عِبَادًا لَّنَآ أُو۟لِى بَأْسٍ شَدِيدٍ فَجَاسُوا۟ خِلَٰلَ ٱلدِّيَارِ ۚ وَكَانَ وَعْدًا مَّفْعُولًا ﴿٥﴾ ثُمَّ رَدَدْنَا لَكُمُ ٱلْكَرَّةَ عَلَيْهِمْ وَأَمْدَدْنَٰكُم بِأَمْوَٰلٍ وَبَنِينَ وَجَعَلْنَٰكُمْ أَكْثَرَ نَفِيرًا ﴿٦﴾ إِنْ أَحْسَنتُمْ أَحْسَنتُمْ لِأَنفُسِكُمْ ۖ وَإِنْ أَسَأْتُمْ فَلَهَا ۚ فَإِذَا جَآءَ وَعْدُ ٱلْءَاخِرَةِ لِيَسُۥٓـُٔوا۟ وُجُوهَكُمْ وَلِيَدْخُلُوا۟ ٱلْمَسْجِدَ كَمَا دَخَلُوهُ أَوَّلَ مَرَّةٍ وَلِيُتَبِّرُوا۟ مَا عَلَوْا۟ تَتْبِيرًا ﴿٧﴾

سورەتی (الإسراء)

بەناوی خوای بەخشندە و میهرەبان

(١) پاکی و بێگەردی و ستایش بۆ ئەو زاتەی کە شەورەوی کرد لە بەشێکی کەمی شەودا بەبەندەی خۆی (محمدﷺ) لە مزگەوتی (حرام، کەعبەی پیرۆزەوە) بۆ مزگەوتی (الاقصی) لە (بیت المقدس) کە دەوروبەریمان پیرۆزو پڕ بەرەکەت کردووە، تا هەندێک نیشانە و بەڵگەو دەسەڵاتداری و توانایی خۆمانی نیشان بدەین، بەڕاستی ئەو زاتە بیسەرو بینایە.

(٢) ئێمە کتێبی (تەوراتمان) بەخشی بە موسا کردمانە هۆی هیدایەت و ڕێنموویی بۆ نەوەی ئیسرائیل، بۆ ئەوەی کەسی تر جگە لە من نەکەنە پشتیوان و یاریدەدەر بۆ خۆیان.

(٣) (ئەمانەو خەڵکی تریش) نەوەی ئەو کەسانەن کە (لە کەشتیەکەدا) لەگەڵ نوح دا هەڵمان گرتن (تا سوپاسگوزار بن و قەدری نازو نیعمەت و بەخششەکان بزانن)، چونکە بەڕاستی (نوح) بەندەیەکی زۆر سوپاسگوزار بوو.

(٤) لە کتێبی تەوراتدا یان لە لوح المحفوظ دا بڕیارمان داوە و پەیمان ڕاگەیاندوون کە سوێند بە خوا ئێوە (لە بەرنامەی ئێمە لادەدەن و یاخی دەبن) و فساد و خراپە دووجار لە زەویدا بەرپا دەکەن، (لە غەفڵەتی خەڵکیدا) زۆرگەشە دەکەن و دەسەڵاتێکی زۆر گەورە بەدەست دەهێنن (لەم سەردەمەدا دووبارە ئەم هەواڵە قورئانیە هاتۆتەوە دی).

(٥) جا کاتێک (ئەی جوولەکان) بەڵێنی یەکەمیان دێت (کە تۆڵەتان لێ بکەینەوە) بەندە تایبەتیەکانی خۆمان دەنێرینە سەرتان کە خاوەنی هێزو توانای زۆرن، ئیتر ئەوان بە هەموو کون وکەلێنێکی قەڵاو شارۆچکەکاندا دەسوڕێنەوە و دەگەڕێن بە شوێنیانداو ئەم هەڕەشەی تۆڵەیە بەڵێنی خوایەو دەبێت بێتە دی (زانایانی سەردەم دەڵێن، ـ عباداً لنا ـ مەبەست هاوەڵانی پێغەمبەرە کە قورئان وەسفی کردوون بە توندو تیژی دژ بە خوانەناسان لەکاتی جەنگدا).

(٦) لە دوای ئەو لاوازیەتان (ئەی جوولەکان، لە غەفڵەت و دواکەوتنی جیهانی ئیسلامدا) نۆرەتان دەدەینەوە و دەسەڵاتمان بەسەر وڵاتی ئیمانداراندا پێدەدەین وماڵ و سامان و کوڕی زۆرتان پێدەبەخشین و واتان لێدەکردن کە زۆر ئامادە بن بۆ هێرش بردن و پەلاماردان و پڕوپاگەندە کردن.

(٧) ئەگەر (لەکاتی دەسەڵاتدا) چاکە بکەن، ئەوە هەر بۆ خۆتان چاک و بەسوودە، ئەگەر خراپە و تاوانیش بکەن ئەوە هەر بەخەی خۆتان دەگرێتەوە، جا کاتێک کە نۆرەی ئەنجامدانی بەڵێنی دواجار دێت، ئیمانداران کارێکتان پێ دەکەن کە لە روخسارتاندا ڕەنگ بداتەوە (چونکە ئەوان دڵنیان کە هەموو ئەو بەڵاو ناخۆشیانەی بەسەر گەلانی موسوڵماندا بەگشتی، هاتووە بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ دەستی ئەوانی تیادایە)، ئەوسا دەبا ئیماندار بچنە مزگەوتەوە وەکو یەکەمجار چوونە ناوی، دەبا ئیتر ئیمانداران تۆڵەی خۆیان بکەنەوە و دەستیان بەسەر هەر چیەکدا دەڕوات درێغی نەکەن (چونکە ئەوان لە ستەم و زۆرداری وخوێن ڕێژی درێغیان نەکرد).

عَسَىٰ رَبُّكُمْ أَن يَرْحَمَكُمْ ۚ وَإِنْ عُدتُّمْ عُدْنَا ۘ وَجَعَلْنَا جَهَنَّمَ لِلْكَافِرِينَ حَصِيرًا ﴿٨﴾ إِنَّ هَٰذَا الْقُرْآنَ يَهْدِي لِلَّتِي هِيَ أَقْوَمُ وَيُبَشِّرُ الْمُؤْمِنِينَ الَّذِينَ يَعْمَلُونَ الصَّالِحَاتِ أَنَّ لَهُمْ أَجْرًا كَبِيرًا ﴿٩﴾ وَأَنَّ الَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ بِالْآخِرَةِ أَعْتَدْنَا لَهُمْ عَذَابًا أَلِيمًا ﴿١٠﴾ وَيَدْعُ الْإِنسَانُ بِالشَّرِّ دُعَاءَهُ بِالْخَيْرِ ۖ وَكَانَ الْإِنسَانُ عَجُولًا ﴿١١﴾ وَجَعَلْنَا اللَّيْلَ وَالنَّهَارَ آيَتَيْنِ ۖ فَمَحَوْنَا آيَةَ اللَّيْلِ وَجَعَلْنَا آيَةَ النَّهَارِ مُبْصِرَةً لِّتَبْتَغُوا فَضْلًا مِّن رَّبِّكُمْ وَلِتَعْلَمُوا عَدَدَ السِّنِينَ وَالْحِسَابَ ۚ وَكُلَّ شَيْءٍ فَصَّلْنَاهُ تَفْصِيلًا ﴿١٢﴾ وَكُلَّ إِنسَانٍ أَلْزَمْنَاهُ طَائِرَهُ فِي عُنُقِهِ ۖ وَنُخْرِجُ لَهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ كِتَابًا يَلْقَاهُ مَنشُورًا ﴿١٣﴾ اقْرَأْ كِتَابَكَ كَفَىٰ بِنَفْسِكَ الْيَوْمَ عَلَيْكَ حَسِيبًا ﴿١٤﴾ مَّنِ اهْتَدَىٰ فَإِنَّمَا يَهْتَدِي لِنَفْسِهِ ۖ وَمَن ضَلَّ فَإِنَّمَا يَضِلُّ عَلَيْهَا ۚ وَلَا تَزِرُ وَازِرَةٌ وِزْرَ أُخْرَىٰ ۗ وَمَا كُنَّا مُعَذِّبِينَ حَتَّىٰ نَبْعَثَ رَسُولًا ﴿١٥﴾ وَإِذَا أَرَدْنَا أَن نُّهْلِكَ قَرْيَةً أَمَرْنَا مُتْرَفِيهَا فَفَسَقُوا فِيهَا فَحَقَّ عَلَيْهَا الْقَوْلُ فَدَمَّرْنَاهَا تَدْمِيرًا ﴿١٦﴾ وَكَمْ أَهْلَكْنَا مِنَ الْقُرُونِ مِن بَعْدِ نُوحٍ ۗ وَكَفَىٰ بِرَبِّكَ بِذُنُوبِ عِبَادِهِ خَبِيرًا بَصِيرًا ﴿١٧﴾

(٨) ئینجا دوور نی‌یە، پەروەردگارتان بەزەیی پیاتاندا بێتەوەو رەحمتان پێبکات ئەگەر بەخۆتاندا بێنەوەو تەوبە بکەن، خۆ ئەگەر بگەڕێنەوە بۆ پیلانگێڕان و خوێنرێژی ئێمەش دەست دەکەینەوە بەتۆڵەسەندن و تەمێکردنتان، جگە لەوە دۆزەخیش دەکەین بە زیندان بۆ کافران کە تیایدا گیر بخۆن.

(٩) بەڕاستی ئەم قورئانە هیدایەت بەخشە بۆ چاکترین رێگەو رێبازو بەرنامە، مژدەیش دەدات بەو ئیماندارانەی کە کارو کردەوە چاکەکان دەکەن کە بێگومان پاداشتی زۆرو بێسنوور چاوەڕێیانە.

(١٠) بەڕاستی ئەوانەش کە باوەڕ بەرۆژی دوایی ناهێنن، سزایەکی بە ئێش و ئازارمان بۆ ئامادە کردوون.

(١١) ئینسان (کاتێک تەنگەتاو دەبێت) دوعا و نزای شەڕ دەکات، هەروەک چۆن لەکاتی ئاسایدا دۆعای خێر دەکات، ئینسان هەمیشەو بەردەوام بە پەلەو هەڵەشەیە.

(١٢) ئێمە دیاردەی شەوو رۆژمان کردووە بە دوو بەڵگەو نیشانە (لەسەر دەسەڵاتی خۆمان و بۆ حەسانەوە و ئەنجامدانی کاروبارتان و راگرتنی پلەیەکی گەرمای لەبار بۆ ژیانتان)، ئینجا ئێمە تاریکیمان بەسەر دیاردەی شەودا هێناوەو دیاردەی رۆژیشمان بە ئاشکراو دیارو بینراو سازاندووە، تا لە نازو نیعمەتی پەروەردگارتان بەهرەوەر ببن، تا ژمارەی ساڵەکان بزانن و حساب راگرن (کە زۆر پێویستە بۆ رێکخستنی کاروباری ژیان) ئێمە هەموو شتێکی پێویستی ئێوەمان بە فراوانی و بەر بڵاوی روون کردۆتەوە.

(١٣) نامەی کردەوەی هەرکەسێکیشمان هەڵواسیووە بە گەردنیداو لە رۆژی دوایدا کارنامەی کردەوەکانی بۆ دەردەهێنین و بەکراوەیی دەخەینە بەردەستی (ئاشکرایە کە ئەو دەزگایانەی کارو کردەوەی ئێمەی لەسەر تۆمار دەکرێت زۆر پێشکەوتوو ترە لەوەی کە ئادەمیزاد تا ئێستا پەی پێ بردووە).

(١٤) ئەوسا پێی دەوترێت: دەی نامەی کردەوەکانت بخوێنەرەوە و تەماشای بکە، ئەمڕۆ هەرخۆت بڕیار بدە و حساب بۆ خۆت بکە (شایستەی چ جۆرە پاداشتێکیت ؟!)

(١٥) ئەوەی هەوڵی دابێت رێبازی راست و دروست بگرێت، ئەوە بەڕاستی بەقازانجی خۆی تەواو دەبێت و هەر خۆی بەهرە لە هیدایەتەکەی وەردەگرێت، ئەوەش گومڕا بووە و رێبازی سەرلێشێواوی گرتۆتەبەر، ئەوە بێگومان هەر خۆی زەرەر دەکات و گومڕاییەکەی لەسەری دەکەوێت، کەس گوناهی کەس هەڵناگرێت، کەس بەرپرسیار نیە لە هەڵەی کەسانی تر، ئێمەش سزای کەسمان نەداوە تا پێغەمبەرێکی بۆ دەنێرین.

(١٦) کاتێک بمانەوێت دانیشتواني شارو شارۆچکەیەک لەناو ببەین، ئەوە سەرەتا فەرمانی گوێڕایەڵی دەدەین بە دەوڵەمەندەکان (کە گوێ بەحەرام وحەڵاڵ نادەن، کە چاکەو چاکەکاری بکەن) کەچی ئەوان یاخی دەبن و خراپەکاری دەکەن لە شارەکەدا، ئەوسا ئیتر شایستەی ئەوە دەبن کە بڕیاری ئێمە بەسەریاندا بسەپێنرێت، ئینجا ئێمەش کاولی دەکەین بەسەر یەکداو داروبەردی بەسەر یەکەوە ناهێڵین.

(١٧) چەندەها نەوەمان لە دوای نوح لەناو بردووە، ئەوەندەش بەسە بۆ پەروەردگاری تۆ کە ئاگادارو بینایە بەگوناهو تاوانی بەندەکانی، هیچ شتێکی لێ شاراوە نیە.

مَّن كَانَ يُرِيدُ ٱلْعَاجِلَةَ عَجَّلْنَا لَهُۥ فِيهَا مَا نَشَآءُ لِمَن نُّرِيدُ ثُمَّ جَعَلْنَا لَهُۥ جَهَنَّمَ يَصْلَىٰهَا مَذْمُومًا مَّدْحُورًا ﴿١٨﴾ وَمَنْ أَرَادَ ٱلْـَٔاخِرَةَ وَسَعَىٰ لَهَا سَعْيَهَا وَهُوَ مُؤْمِنٌ فَأُو۟لَـٰٓئِكَ كَانَ سَعْيُهُم مَّشْكُورًا ﴿١٩﴾ كُلًّا نُّمِدُّ هَـٰٓؤُلَآءِ وَهَـٰٓؤُلَآءِ مِنْ عَطَآءِ رَبِّكَ ۚ وَمَا كَانَ عَطَآءُ رَبِّكَ مَحْظُورًا ﴿٢٠﴾ ٱنظُرْ كَيْفَ فَضَّلْنَا بَعْضَهُمْ عَلَىٰ بَعْضٍ ۚ وَلَلْـَٔاخِرَةُ أَكْبَرُ دَرَجَـٰتٍ وَأَكْبَرُ تَفْضِيلًا ﴿٢١﴾ لَّا تَجْعَلْ مَعَ ٱللَّهِ إِلَـٰهًا ءَاخَرَ فَتَقْعُدَ مَذْمُومًا مَّخْذُولًا ﴿٢٢﴾ ۞ وَقَضَىٰ رَبُّكَ أَلَّا تَعْبُدُوٓا۟ إِلَّآ إِيَّاهُ وَبِٱلْوَٰلِدَيْنِ إِحْسَـٰنًا ۚ إِمَّا يَبْلُغَنَّ عِندَكَ ٱلْكِبَرَ أَحَدُهُمَآ أَوْ كِلَاهُمَا فَلَا تَقُل لَّهُمَآ أُفٍّ وَلَا تَنْهَرْهُمَا وَقُل لَّهُمَا قَوْلًا كَرِيمًا ﴿٢٣﴾ وَٱخْفِضْ لَهُمَا جَنَاحَ ٱلذُّلِّ مِنَ ٱلرَّحْمَةِ وَقُل رَّبِّ ٱرْحَمْهُمَا كَمَا رَبَّيَانِى صَغِيرًا ﴿٢٤﴾ رَّبُّكُمْ أَعْلَمُ بِمَا فِى نُفُوسِكُمْ ۚ إِن تَكُونُوا۟ صَـٰلِحِينَ فَإِنَّهُۥ كَانَ لِلْأَوَّٰبِينَ غَفُورًا ﴿٢٥﴾ وَءَاتِ ذَا ٱلْقُرْبَىٰ حَقَّهُۥ وَٱلْمِسْكِينَ وَٱبْنَ ٱلسَّبِيلِ وَلَا تُبَذِّرْ تَبْذِيرًا ﴿٢٦﴾ إِنَّ ٱلْمُبَذِّرِينَ كَانُوٓا۟ إِخْوَٰنَ ٱلشَّيَـٰطِينِ ۖ وَكَانَ ٱلشَّيْطَـٰنُ لِرَبِّهِۦ كَفُورًا ﴿٢٧﴾

(١٨) ئەوەی مەبەستی تەنها دنیابێت کە بەپەلەو بەخێرایی تێدەپەڕێت، ئەوە ئێمە (بە ئارەزووی کەس ناکەین بەڵکو) هەرچیمان بوێت بە زوویی، بەویستی خۆمان و بە هەرکەس کە بمانەوێت دەیبەخشین، پاشان (لەو جیهان) ئەو جۆرە کەسانە (واتە دنیا پەرستان) دەخەینە ناو دۆزەخەوە، بە سەرزەنشت کراوی و راونراویەوە (کە بەردەوام فریشتەکان ئێش دەکەن بەدڵیاندا و نایەڵن پشوو بدەن، هەر راویان دەنێن بەناو تونێل و شوێنە سامناکەکاندا).

(١٩) (بەلام) ئەوەش مەبەستی بەشی ئەو جیهان بێت و هەوڵ و کۆششی چاکی بۆ بدات، لە هەمان کاتیشدا ئیماندار بێت، هەوڵ و کۆششی ئەو جۆرە کەسانە جێگەی رێزو سوپاسە و سوپاسکراون.

(٢٠) ئێمە هەردوولا (دنیا پەرستان و خوا پەرستان) لە بەخششی پەروەردگارت بەهرەوەر دەکەین، بێگومان بەخششی پەروەردگارت سنووردار و قەدەغە کراو نیە لە دنیادا.

(٢١) تەماشا بکە و سەرنج بدە چۆن رێزو پلە و پایەی هەندێکیانمان داوە بەسەر هەندێکی تریاندا ، بێگومان پلە و جیاوازیەکانی ئەو جیهان زۆر گەورەتر و زۆر زیاترن.

(٢٢) (ئەی ئینسان) هەرگیز نەکەیت خوایەکی تر بکەیتە هاوتای خواو هاوەڵی بۆ بڕیار بدەیت چونکە بەو کارەت زەبوون و خەجاڵەت دەبیت.

(٢٣) پەروەردگاری تۆ بڕیاریداوە کە جگە لەو کەسی تر نەپەرستن، هەروەها بڕیاریداوە چاکەکاریش بن لەگەڵ دایک و باوکتاندا، هەرکاتێک یەکێکیان یان هەردووکیان بە پیری کەوتنە لای تۆ (تەنانەت) ئۆفیان لە دەست مەکە و (هەرگیز) پیایاندا هەڵمەشاخێ و هاواریان بەسەردا مەکە، بەردەوامیش قسە و گفتوگۆت لەگەڵیاندا با چاک و جوان و بەجێ بێت.

(٢٤) باڵی میهرەبانی خۆتیان بۆ ڕاخە و ملکەچ بە بۆیان، نزا بکە و بڵێ: پەروەردگارا رەحمیان پێ بکە و میهرەبان بە بۆیان، هەروەکو چۆن ئەوان رەحمیان بەمن کردوو و منیان پەروەردە کردووە بە بچووکی و منداڵی.

(٢٥) پەروەردگارتان زۆر زاناترە لەخۆتان بەوەی کە لەدڵ و دەروونتاندا هەیە، خۆ ئەگەر چاک و پاک و رێکو پێک بن، ئەوە بەڕاستی ئیتر ئەو زاتە بۆ تەوبەکاران و پەشیمانان زۆر لێخۆشبوو بەخشندەیە.

(٢٦) مافی خزم و خوێشان بەجێ بهێنە و پەیوەندیەکان (لە چوار چێوەی شەرعدا چاودێری بکە) هەروەها مافی هەژارانیش (بە یارمەتیدانیان بە گوێرەی توانا) ئەنجام بدە هەروەها مافی رێبواریش (بەدەستگیرۆیی و رێ نیشاندان) جێبەجێ بکە، دەست بلاویش مەبە و ماڵ و سامانت بەفیرۆ مەدە.

(٢٧) چونکە بەڕاستی ئەوانەی ماڵ و سامانیان بەفیرۆ دەدەن (لە رێگەی خراپدا سەرفی دەکەن)، ئەوانە هەمیشە وەک برای شەیتانەکان وان، شەیتانیش لە بەرامبەر (نازو نیعمەتەکانی) پەروەردگاریەوە زۆر ناشوکرو بەدنمەکە.

وَإِمَّا تُعْرِضَنَّ عَنْهُمُ ٱبْتِغَآءَ رَحْمَةٍ مِّن رَّبِّكَ تَرْجُوهَا فَقُل لَّهُمْ قَوْلًا مَّيْسُورًا ﴿٢٨﴾ وَلَا تَجْعَلْ يَدَكَ مَغْلُولَةً إِلَىٰ عُنُقِكَ وَلَا تَبْسُطْهَا كُلَّ ٱلْبَسْطِ فَتَقْعُدَ مَلُومًا مَّحْسُورًا ﴿٢٩﴾ إِنَّ رَبَّكَ يَبْسُطُ ٱلرِّزْقَ لِمَن يَشَآءُ وَيَقْدِرُ ۚ إِنَّهُۥ كَانَ بِعِبَادِهِۦ خَبِيرًۢا بَصِيرًا ﴿٣٠﴾ وَلَا تَقْتُلُوٓا۟ أَوْلَٰدَكُمْ خَشْيَةَ إِمْلَٰقٍ ۖ نَّحْنُ نَرْزُقُهُمْ وَإِيَّاكُمْ ۚ إِنَّ قَتْلَهُمْ كَانَ خِطْـًٔا كَبِيرًا ﴿٣١﴾ وَلَا تَقْرَبُوا۟ ٱلزِّنَىٰٓ ۖ إِنَّهُۥ كَانَ فَٰحِشَةً وَسَآءَ سَبِيلًا ﴿٣٢﴾ وَلَا تَقْتُلُوا۟ ٱلنَّفْسَ ٱلَّتِى حَرَّمَ ٱللَّهُ إِلَّا بِٱلْحَقِّ ۗ وَمَن قُتِلَ مَظْلُومًا فَقَدْ جَعَلْنَا لِوَلِيِّهِۦ سُلْطَٰنًا فَلَا يُسْرِف فِّى ٱلْقَتْلِ ۖ إِنَّهُۥ كَانَ مَنصُورًا ﴿٣٣﴾ وَلَا تَقْرَبُوا۟ مَالَ ٱلْيَتِيمِ إِلَّا بِٱلَّتِى هِىَ أَحْسَنُ حَتَّىٰ يَبْلُغَ أَشُدَّهُۥ ۚ وَأَوْفُوا۟ بِٱلْعَهْدِ ۖ إِنَّ ٱلْعَهْدَ كَانَ مَسْـُٔولًا ﴿٣٤﴾ وَأَوْفُوا۟ ٱلْكَيْلَ إِذَا كِلْتُمْ وَزِنُوا۟ بِٱلْقِسْطَاسِ ٱلْمُسْتَقِيمِ ۚ ذَٰلِكَ خَيْرٌ وَأَحْسَنُ تَأْوِيلًا ﴿٣٥﴾ وَلَا تَقْفُ مَا لَيْسَ لَكَ بِهِۦ عِلْمٌ ۚ إِنَّ ٱلسَّمْعَ وَٱلْبَصَرَ وَٱلْفُؤَادَ كُلُّ أُو۟لَٰٓئِكَ كَانَ عَنْهُ مَسْـُٔولًا ﴿٣٦﴾ وَلَا تَمْشِ فِى ٱلْأَرْضِ مَرَحًا ۖ إِنَّكَ لَن تَخْرِقَ ٱلْأَرْضَ وَلَن تَبْلُغَ ٱلْجِبَالَ طُولًا ﴿٣٧﴾ كُلُّ ذَٰلِكَ كَانَ سَيِّئُهُۥ عِندَ رَبِّكَ مَكْرُوهًا ﴿٣٨﴾

(٢٨) خۆ ئەگەر نەتتوانی یارمەتی ناوبراوان بدەیت و بەئومێدی ڕەحمەتی پەروەردگارو بەخششی ئەو بوویت ئەوە دەکرێت بەگوفتاری جوان و قسەی خۆش ڕازییان بکەیت.

(٢٩) نەکەیت ئەوەندە دەست نوقاو بیت وەک ئەوەی کە دەستی بەکۆت و زنجیر بەگەردنیدا هەڵواسرابێت، هەروەها ئەوەندەش دەست بڵاو مەبە (هیچیت بەدەستەوە نەمێنێت) لەوەودوا بکەویتە بەردەم لۆمەو سەرزەنشتی ئەمو ئەوو هیچت بە دەستەوە نەمێنێت و بەهەناسە ساردی و نائومێدی بۆی دانیشیت.

(٣٠) بەڕاستی پەروەردگارت بە هەرکەس کە بیەوێت ڕزق و ڕۆزی فراوان دەبەخشێت، یاخود کەم و سنوورداری دەکات، بێگومان ئەو زاتە ئاگادارو بینایە بەبەندەکانی، (بەخشین و نەبەخشینی هەرەمەکی نیە).

(٣١) نەکەن منداڵەکانتان لە ترسی گرانی و برسێتی بکوژن (چونکە پەروەردگارتان ڕۆزی بەخش و میهرەبانە)، ئێمە ڕزق و ڕۆزی دەبەخشین بەوانیش و بەئێوەش، چونکە بەڕاستی کوشتنی ئەوان گوناهو تاوانێکی زۆر گەورەیە.

(٣٢) هەرگیز نەکەن توخنی زینا بکەون و لێی نزیک ببنەوە، چونکە ئەوە بەڕاستی گوناهو تاوان و هەڵە و ڕێچکەیەکی زۆر ناقۆڵایە.

(٣٣) کەسێک نەکوژن کە خوا کوشتنەکەی حەرام کردبێت مەگەر بەهۆی تاوانێکەوە شایستە بێت و کوشتنی ڕەوا بێت، ئەوەش کە مەزڵومانە و بێ تاوان دەکوژرێت، ئەوە ئێمە بەڕاستی ماف و دەسەڵاتمان داوە بەنزیکترین کەسی کە تۆڵەی بۆ بسێنێت، ئەویش نابێت زیادەڕەویی بکات لە کوشتن و تۆڵەسەندنەوەدا، (خۆ ئەگەر لەخواترس و فەرمانبەردار بوو لەو کارەیدا) ئەوە بێگومان سەرکەوتوو و پشتیوانی لێکراوە لە لایەن دەسەڵاتی ڕەواوە.

(٣٤) نزیک ماڵی هەتیوو مەکەون مەگەر بەجوانترین شێوە نەبێت (وەک ئەوەی بیخەنە بازرگانیەکەوە تا گەشە بکات) هەتا ئەگاتە هەرەتی لاوی، وەفا بکەن بە بەڵێن و پەیمان، چونکە بەڕاستی بەرپرسیارن لە بەرامبەر بەڵێن و پەیمانەوە.

(٣٥) هەرکاتێک کێشان و پێوانتان ئەنجامدا بەرێک و پێکی و تێرو تەواوی ئەنجامی بدەن، ئەو شێوەیە چاکترە و جوانترین ئەنجامی هەیە (لە دنیادا ئاسوودە دەبن و پاداشتی قیامەتیش بەدەست دەهێنن).

(٣٦) (ئەی ئینسان) لە شتێک مەدوێ و شوێنی شتێک مەکەوە کە زانست و زانیاریت دەربارەی نیە، چونکە بەڕاستی دەزگاکانی بیستن و بینین و تێگەیشتن هەرهەمووی، بەرپرسیارە لە بەرامبەریەوە.

(٣٧) هەروەها بەسەر زەویدا بەکەش و فش و لەخۆبایی بوونەوە مەڕۆ، چونکە تۆ هەرگیز ناتوانیت زەوی کونادەر بکەیت، ناشگەیتە بەرزی چیاکان (ئیتر ئەم کەشخە و شانازیەت لە چی‌یە؟).

(٣٨) هەموو ئەو شتانەی کە لە ئایەتەکانی پێشوودا باسمان کرد، خراپەکانی لای پەروەردگارت ناپەسەندو نابەجێیە (هەوڵ بدە هەمیشە دوورە پەرێزبیت لێیان).

ذَٰلِكَ مِمَّآ أَوْحَىٰٓ إِلَيْكَ رَبُّكَ مِنَ ٱلْحِكْمَةِ ۗ وَلَا تَجْعَلْ مَعَ ٱللَّهِ إِلَٰهًا ءَاخَرَ فَتُلْقَىٰ فِى جَهَنَّمَ مَلُومًا مَّدْحُورًا ﴿٣٩﴾ أَفَأَصْفَىٰكُمْ رَبُّكُم بِٱلْبَنِينَ وَٱتَّخَذَ مِنَ ٱلْمَلَٰٓئِكَةِ إِنَٰثًا ۚ إِنَّكُمْ لَتَقُولُونَ قَوْلًا عَظِيمًا ﴿٤٠﴾ وَلَقَدْ صَرَّفْنَا فِى هَٰذَا ٱلْقُرْءَانِ لِيَذَّكَّرُوا۟ وَمَا يَزِيدُهُمْ إِلَّا نُفُورًا ﴿٤١﴾ قُل لَّوْ كَانَ مَعَهُۥٓ ءَالِهَةٌ كَمَا يَقُولُونَ إِذًا لَّٱبْتَغَوْا۟ إِلَىٰ ذِى ٱلْعَرْشِ سَبِيلًا ﴿٤٢﴾ سُبْحَٰنَهُۥ وَتَعَٰلَىٰ عَمَّا يَقُولُونَ عُلُوًّا كَبِيرًا ﴿٤٣﴾ تُسَبِّحُ لَهُ ٱلسَّمَٰوَٰتُ ٱلسَّبْعُ وَٱلْأَرْضُ وَمَن فِيهِنَّ ۚ وَإِن مِّن شَىْءٍ إِلَّا يُسَبِّحُ بِحَمْدِهِۦ وَلَٰكِن لَّا تَفْقَهُونَ تَسْبِيحَهُمْ ۗ إِنَّهُۥ كَانَ حَلِيمًا غَفُورًا ﴿٤٤﴾ وَإِذَا قَرَأْتَ ٱلْقُرْءَانَ جَعَلْنَا بَيْنَكَ وَبَيْنَ ٱلَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ بِٱلْءَاخِرَةِ حِجَابًا مَّسْتُورًا ﴿٤٥﴾ وَجَعَلْنَا عَلَىٰ قُلُوبِهِمْ أَكِنَّةً أَن يَفْقَهُوهُ وَفِىٓ ءَاذَانِهِمْ وَقْرًا ۚ وَإِذَا ذَكَرْتَ رَبَّكَ فِى ٱلْقُرْءَانِ وَحْدَهُۥ وَلَّوْا۟ عَلَىٰٓ أَدْبَٰرِهِمْ نُفُورًا ﴿٤٦﴾ نَّحْنُ أَعْلَمُ بِمَا يَسْتَمِعُونَ بِهِۦٓ إِذْ يَسْتَمِعُونَ إِلَيْكَ وَإِذْ هُمْ نَجْوَىٰٓ إِذْ يَقُولُ ٱلظَّٰلِمُونَ إِن تَتَّبِعُونَ إِلَّا رَجُلًا مَّسْحُورًا ﴿٤٧﴾ ٱنظُرْ كَيْفَ ضَرَبُوا۟ لَكَ ٱلْأَمْثَالَ فَضَلُّوا۟ فَلَا يَسْتَطِيعُونَ سَبِيلًا ﴿٤٨﴾ وَقَالُوٓا۟ أَءِذَا كُنَّا عِظَٰمًا وَرُفَٰتًا أَءِنَّا لَمَبْعُوثُونَ خَلْقًا جَدِيدًا ﴿٤٩﴾

(٣٩) ئەو ڕێنموییانەی کە پەروەردگارت بە وەحی بۆی ڕەوانە کردیت بەشێکن لە حیکمەت و دانایی، ئەکەیت خوایەکی تر بەهاوتای خوای بالادەست بزانیت، چونکە ئەگەر وابیت، فڕێ دەدرێیتە ناو ئاگری دۆزەخەوە بە سەرزەنشت کراوی و ریسوایی و شەرمەزاری و دوور خراوەی لە بەزەیی خوایی.

(٤٠) ئینجا روو بەهاوەڵگەران دەفەرموێت: ئایا ڕەوایە خوا ئێوەی هەڵبژاردبێت تا کوڕتان پێ ببەخشێت و خۆی فریشتەکانی هەڵبژاردبێت تا بیانکات بەکچی خۆی؟ (ئەم بیروباوەڕە پووچ و بێ سەروبنانە کەی ڕەوایە، مەگەر کوڕ و کچ هەر خوا نایانبەخشێت؟)، بەڕاستی ئێوە قسە و گوفتارێکی نابەجێ و گەورە وناقۆڵا دەکەن.

(٤١) سوێند بە خوا بەڕاستی ئێمە لەم قورئانەدا بە چەندەها شێوە لە هەموو مەبەستەکان دواوین تا بیربکەنەوە و یاداوەری وەربگرن، کەچی قورئان بۆ خوانەناسان تەنها دووره پەرێزی نەبێت هیچی تریان بۆ زیاد ناکات.

(٤٢) (ئەی پێغەمبەر ﷺ بەو موشریکانە) بڵێ: ئەگەر خوای تریش هەبوایە لەگەڵ خوای پەروەردگاردا هەروەکو ئەوان دەڵێن.. ئەو کاتە هەموان هەوڵیاندەدا بۆ ئەوەی دەسەلات لەخاوەنی عەرش و تەختی فەرمانڕەوایەتی بسەنن و لێی زەوت بکەن.

(٤٣) ستایش و پاکی و بڵندی بۆ ئەو پەروەردگارەیە (کە ئەو نەفامانە دەربارەی ئەو هەموو ناڕەواییە دەڵێن) و ئەو زاتە زۆر بەرز و بڵند و گەورەترە (لە بۆچوونی ئەوان).

(٤٤) هەر حەوت ئاسمانەکان و زەوی و هەموو ئەوانەی کە تیایاندا هەن، تەسبیحات و ستایشی ئەو زاتە دەکەن، هیچ شتێک نییە لەم بوونەوەرەدا کە تەسبیحات و ستایش و سوپاسی ئەو زاتە نەکات، بەڵام ئێوە لە تەسبیحات و ستایشی ئەو شتانە تێناگەن، بەڕاستی ئەو زاتە هەمیشە و بەردەوام خۆگر و بە حەوسەڵەیە (لەبەرامبەر لادانی خەڵکیەوە) لێخۆشبووە و چاوپۆشی دەکات (ئەگەر ڕووی تێبکەن و باوەڕی پێ بهێنن).

(٤٥) کاتێک کە قورئان دەخوێنیت ئێمە بەربەستێکی نادیارو شاراوە، دەخەینە نێوان تۆو ئەوانەی باوەڕ بە ڕۆژی دوایی ناهێنن .. (چونکە سوودی لێ وەرناگرن)

(٤٦) (چونکە مەبەستیان نیە تێبگەن) ئێمەش پەردە دەهێنین بەسەر دڵیاندا تا هەرتێی نەگەن، گوێشیان سەنگین دەکەین تا نەیبیستن، جا کاتێک لە قورئاندا تەنها ناوی پەروەردگارت دەبەیت (باسی بت و بەرنامەیان ناکەیت)، ئەوە پشت هەڵدەکەن و ڕوو وەردەگێڕن و بێزاری دەردەبڕن و دەڕۆن.

(٤٧) ئێمە لە هەموو کەس چاکتر دەزانین کە خوانەناسان بۆ گوێت بۆ دەگرن، ئەوانە کاتێک گوێت لێ دەگرن، چپە چپ و سرتە سرت دەکەن، ئەوسا ستەمکاران بەیەکتر دەڵێن: ئێوە شوێن کەس ناکەون تەنها پیاوێکی جادوو لێکراو نەبێت!!

(٤٨) سەرنج بدە چۆن تۆ دەکەن بە نموونە (تاوێک دەڵێن: جادووگەر، دەمێک دەڵێن: شاعیر...هتد) سەرئەنجام خۆیان گومڕا کردووە و ناتوانن ڕێگە و ڕێبازێکی چاک و دروست بگرنەبەر.

(٤٩) ئەوانە بە سەرسامیەوە دەڵێن: باشە ئەگەر بووینە ئێسکی رزیو و پرتوکاو، ئەوە سەر لە نوێ زیندوو دەکرێینەوە؟!



۞ قُلْ كُونُوا۟ حِجَارَةً أَوْ حَدِيدًا ﴿٥٠﴾ أَوْ خَلْقًا مِّمَّا يَكْبُرُ فِى صُدُورِكُمْ ۚ فَسَيَقُولُونَ مَن يُعِيدُنَا ۖ قُلِ ٱلَّذِى فَطَرَكُمْ أَوَّلَ مَرَّةٍ ۚ فَسَيُنْغِضُونَ إِلَيْكَ رُءُوسَهُمْ وَيَقُولُونَ مَتَىٰ هُوَ ۖ قُلْ عَسَىٰٓ أَن يَكُونَ قَرِيبًا ﴿٥١﴾ يَوْمَ يَدْعُوكُمْ فَتَسْتَجِيبُونَ بِحَمْدِهِۦ وَتَظُنُّونَ إِن لَّبِثْتُمْ إِلَّا قَلِيلًا ﴿٥٢﴾ وَقُل لِّعِبَادِى يَقُولُوا۟ ٱلَّتِى هِىَ أَحْسَنُ ۚ إِنَّ ٱلشَّيْطَٰنَ يَنزَغُ بَيْنَهُمْ ۚ إِنَّ ٱلشَّيْطَٰنَ كَانَ لِلْإِنسَٰنِ عَدُوًّا مُّبِينًا ﴿٥٣﴾ رَّبُّكُمْ أَعْلَمُ بِكُمْ ۖ إِن يَشَأْ يَرْحَمْكُمْ أَوْ إِن يَشَأْ يُعَذِّبْكُمْ ۚ وَمَآ أَرْسَلْنَٰكَ عَلَيْهِمْ وَكِيلًا ﴿٥٤﴾ وَرَبُّكَ أَعْلَمُ بِمَن فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۗ وَلَقَدْ فَضَّلْنَا بَعْضَ ٱلنَّبِيِّـۧنَ عَلَىٰ بَعْضٍ ۖ وَءَاتَيْنَا دَاوُۥدَ زَبُورًا ﴿٥٥﴾ قُلِ ٱدْعُوا۟ ٱلَّذِينَ زَعَمْتُم مِّن دُونِهِۦ فَلَا يَمْلِكُونَ كَشْفَ ٱلضُّرِّ عَنكُمْ وَلَا تَحْوِيلًا ﴿٥٦﴾ أُو۟لَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ يَدْعُونَ يَبْتَغُونَ إِلَىٰ رَبِّهِمُ ٱلْوَسِيلَةَ أَيُّهُمْ أَقْرَبُ وَيَرْجُونَ رَحْمَتَهُۥ وَيَخَافُونَ عَذَابَهُۥٓ ۚ إِنَّ عَذَابَ رَبِّكَ كَانَ مَحْذُورًا ﴿٥٧﴾ وَإِن مِّن قَرْيَةٍ إِلَّا نَحْنُ مُهْلِكُوهَا قَبْلَ يَوْمِ ٱلْقِيَٰمَةِ أَوْ مُعَذِّبُوهَا عَذَابًا شَدِيدًا ۚ كَانَ ذَٰلِكَ فِى ٱلْكِتَٰبِ مَسْطُورًا ﴿٥٨﴾

(٥٠) ئەی محمد ﷺ پێیان بڵێ: ببنە بەرد یان ئاسن ...

(٥١) یان هەر شتێک و هەر دروستکراوێک کە زۆر سەخت و گرنگ و گەورەیە لە بیرو هۆشتاندا، ئەوسا ئەوانە (بە سەرسامیەوە) دەڵێن: دەی باشە، کێ زیندوومان دەکاتەوە؟ بڵێ: ئەو زاتەی کە یەکەمجار بەدیهێناون (زۆر لای ئاسانە زیندووتان بکاتەوە)، ئەوسا سەریان شۆڕدەکەنەوە بۆ لات و سەر بادەدەن و دەڵێن: ئەوە کەی زیندوو دەکرێینەوە؟ کەی قیامەت بەرپا دەبێت؟ پێیان بڵێ: دوور نیە و لەوانەیە بەم نزیکانە پێش بێت.

(٥٢) رۆژێک دێت پەروەردگارتان بانگتان لێ دەکات، بەدەم سوپاس و ستایشیەوە (زیندوو دەبنەوە وملکەچ و فەرمانبەردارن) واگومان دەبەن کە ماوەیەکی کەم نەبێت لە دنیادا نەژیاون (یاخود دوای مردنتان ماوەیەکی زۆرکەم لە گۆڕدا بوون).

(٥٣) ئەی پێغەمبەر ﷺ بەبەندەکانم بڵێ: چاکترین گوفتار بڵێن (جوانترین گوفتار بنووسن) چونکە شەیتان بەڕاستی دەیەوێت نێوانیان تێک بدات (هەمیشە هانیان دەدات بۆ وتنی گوفتاری هەڵە و خراپ)، بەڕاستی شەیتان دوژمنی ئاشکرای ئینسانەو (دەبێت وریابێت ئەو دوژمنە تووشی هەڵەی نەکات).

(٥٤) پەروەردگارتان چاکتان دەناسێت خۆ ئەگەر بیەوێت رەحمتان پێ دەکات (کاتێک رێبازی چاکە دەگرنە بەر)، یان ئەگەر بیەوێت سزاتان دەدات (کاتێک رێبازی خراپە دەگرنە بەر)و ئێمە تۆمان بۆ ئەوە رەوانە نەکردووە کە چاودێرو پارێزەری ئەوان بیت (تا ئەوان بە ناچاریی باوەڕ بهێنن).

(٥٥) پەروەردگارت چاک دەزانێت بەوەی لە ئاسمانەکان و زەویدایە (هەریەکەیان سەرگەرمی چین)، بێگومان ئێمە رێزی هەندێ لە پێغەمبەرانمان لەلا زیاترە لە هەندێکی تریان و(کتێبی) زەبووریشمان بە ـ داوود ـ بەخشیوە.

(٥٦) ئەی پێغەمبەر ﷺ بە هاوەڵگەران بڵێ: ئادەی هاناو هاوار بکەن لەوبت و شتانەی کە لەجیاتی خوا دەیانپەرستن (ئایا هیچیان لە دەست دێت؟، دڵنیابن کە ئەوانە) نە دەتوانن بەڵاو ناخۆشیەکتان لەسەر لابەرن، نەدەتوانن بارودۆخ بگۆڕن.

(٥٧) ئا ئەوانەی کە ئەوان هانا و هاواریان لێ دەکەن، کامیان لە خوا نزیکترە؟! لە کاتێکدا کە ئەوان خۆیان هاوار لە خوا دەکەن و داوای نزیک بوونەوە لە پەروەردگاریان دەخوازن و چاوەڕوانی رەحمەتی دەکەن، لە سزاو تۆڵەشی دەترسن، بەڕاستی سزای پەروەردگارت مەترسی لێکراوە.

(٥٨) هیچ شارو شارۆچکەیەک نی یە کە ئێمە بڕیارمان دابێت پێش بەرپابوونی رۆژی قیامەت لە ناوی بەرین، یان سزایەکی سەختی بدەین، لە کتێب و دۆسیەی (تایبەتدا، لە لوح المحفوظ دا) تۆمار نەکرا بێت.

وَمَا مَنَعَنَآ أَن نُّرۡسِلَ بِٱلۡأٓيَٰتِ إِلَّآ أَن كَذَّبَ بِهَا ٱلۡأَوَّلُونَۚ وَءَاتَيۡنَا ثَمُودَ ٱلنَّاقَةَ مُبۡصِرَةٗ فَظَلَمُواْ بِهَاۚ وَمَا نُرۡسِلُ بِٱلۡأٓيَٰتِ إِلَّا تَخۡوِيفٗا ﴿٥٩﴾ وَإِذۡ قُلۡنَا لَكَ إِنَّ رَبَّكَ أَحَاطَ بِٱلنَّاسِۚ وَمَا جَعَلۡنَا ٱلرُّءۡيَا ٱلَّتِيٓ أَرَيۡنَٰكَ إِلَّا فِتۡنَةٗ لِّلنَّاسِ وَٱلشَّجَرَةَ ٱلۡمَلۡعُونَةَ فِي ٱلۡقُرۡءَانِۚ وَنُخَوِّفُهُمۡ فَمَا يَزِيدُهُمۡ إِلَّا طُغۡيَٰنٗا كَبِيرٗا ﴿٦٠﴾ وَإِذۡ قُلۡنَا لِلۡمَلَٰٓئِكَةِ ٱسۡجُدُواْ لِأٓدَمَ فَسَجَدُوٓاْ إِلَّآ إِبۡلِيسَ قَالَ ءَأَسۡجُدُ لِمَنۡ خَلَقۡتَ طِينٗا ﴿٦١﴾ قَالَ أَرَءَيۡتَكَ هَٰذَا ٱلَّذِي كَرَّمۡتَ عَلَيَّ لَئِنۡ أَخَّرۡتَنِ إِلَىٰ يَوۡمِ ٱلۡقِيَٰمَةِ لَأَحۡتَنِكَنَّ ذُرِّيَّتَهُۥٓ إِلَّا قَلِيلٗا ﴿٦٢﴾ قَالَ ٱذۡهَبۡ فَمَن تَبِعَكَ مِنۡهُمۡ فَإِنَّ جَهَنَّمَ جَزَآؤُكُمۡ جَزَآءٗ مَّوۡفُورٗا ﴿٦٣﴾ وَٱسۡتَفۡزِزۡ مَنِ ٱسۡتَطَعۡتَ مِنۡهُم بِصَوۡتِكَ وَأَجۡلِبۡ عَلَيۡهِم بِخَيۡلِكَ وَرَجِلِكَ وَشَارِكۡهُمۡ فِي ٱلۡأَمۡوَٰلِ وَٱلۡأَوۡلَٰدِ وَعِدۡهُمۡۚ وَمَا يَعِدُهُمُ ٱلشَّيۡطَٰنُ إِلَّا غُرُورًا ﴿٦٤﴾ إِنَّ عِبَادِي لَيۡسَ لَكَ عَلَيۡهِمۡ سُلۡطَٰنٞۚ وَكَفَىٰ بِرَبِّكَ وَكِيلٗا ﴿٦٥﴾ رَّبُّكُمُ ٱلَّذِي يُزۡجِي لَكُمُ ٱلۡفُلۡكَ فِي ٱلۡبَحۡرِ لِتَبۡتَغُواْ مِن فَضۡلِهِۦٓۚ إِنَّهُۥ كَانَ بِكُمۡ رَحِيمٗا ﴿٦٦﴾

(٥٩) هیچ شتێک نەبووە بەهۆی ئەوەی کە ئێمە موعجیزە بەرپا بکەین و نیشانی بدەین لەوەی کە ئەوان داوایان کردووە، تەنها ئەوە نەبێت کە (جۆرەها موعجیزەمان نیشانی پێشینەکان دا)، بەڵام ئەوان هەر بروایان پێ نەکرد؛ ئێمەش لەناومان بردن، حوشترە تایبەتیەکەشمان بە ئاشکراو روون بە قەومی (ثمود) بەخشی، کەچی ستەمیان لێکردو (سەریان بڕی)، بەڕاستی ئێمە تەنها بۆ ترس و داچڵەکاندن نەبێت، هیچ جۆرە موعجیزەیەک نانێرین.

(٦٠) ئەی محمد ﷺ یادی ئەوە بکە کاتێک پێمان وتی: کە بەڕاستی پەروەردگاری تۆ دەوری خەڵکی داوە و ئاگادارە بەهەموو شتێکیان و ئەوشتانەش کە لە خەوندا نیشانمان دایت تەنها تاقیکردنەوە بوو بۆ خەڵکی، هەروەها بەباسی درەختە نەفرین لێ کراوەکەش کە لەقورئاندا ناو براوە تاقیاندەکەینەوە (کافرەکان کردیانە گاڵتەجاڕ و وتیان: چۆن درەخت لەناو ئاگردا دەڕوێت، عەقڵیان کول بوو لەئاستی توانای بێ سنووری خوایدا)، بەمەرجێک ئێمە دەمانەوێت بەم باسانە بیانترسێنین، دایانبچڵەکێنین، کەچی ئەو باسانە هیچیان بۆ زیاد ناکات تەنها لادان و یاخی بوونێکی گەورە و بێ سنوور نەبێت.

(٦١) (بیریان بهێنەرەوە) کاتێک بە فریشتەکانمان وت: ئادەی سوژدە بەرن بۆ ئادەم، هەموو سوژدەیان برد جگە لە (ئیبلیس)، کە وتی: ئایا چۆن سوژدە دەبەم بۆ ئەو کەسەی کە لە قوڕ دروستت کردووە؟!

(٦٢) (پاشان بێ شەرمانە) وتی: پێم بڵێ؛ ئا ئەمەیە کە ڕێزت داوە بەسەر مندا؟! سوێند بە خوا ئەگەر دوام بخەیت تا ڕۆژی قیامەت ئەوە بێگومان هەموو نەوەکانی گومڕاو سەرگەردان دەکەم جگە لە کەمێکیان (کە دەسەڵاتم بەسەریاندا نیە).

(٦٣) خوای پەروەردگار فەرمووی: بڕۆ ئەوەی شوێنی تۆ بکەوێت لەوان، ئەوە بێگومان دۆزەخ پاداشتی هەموانتانە، کە پاداشتێکی مسۆگەرە و جێگەی هەمووتانی تێدا دەبێتەوە...

(٦٤) بڕۆ چیت لە دەست دێت درێغی مەکە، هەرکەس کە توانیت (لەو بەدبەختانە) بە بانگ کردن و هاندانیان بۆ تاوانکاری، دایانبڕە، بەهۆی لەشکری سوارەو پیادەی خۆتەوە هێرشیان بۆ بەرەو هاوبەشییان بکە لە ماڵ و سامان و منداڵ و نەوەیاندا (بەسامانی حەرام و منداڵی زۆڵ. ..هتد)، ئەوەندەش بەڵێن و ئومێدیان پێ بدە، سەریان لێ بشێوێنە، هەرچەندە بەڵێن و هاندانی شەیتان جگە لە فریودان و فێڵکردن و ساختە، شتێکی تر نیە.

(٦٥) بەڕاستی بەندەکانی من (ئەی شەیتانی نەفرین لێکراو) هیچ دەسەڵاتی تۆیان لەسەر نابێت و هەوڵ و کۆششی تۆ کاریان تێ ناکات و پەروەردگاری تۆ (ئەی ئیماندار) بەسە بۆ پارێزگاری و پاراستنت.

(٦٦) پەروەردگارتان ئەو زاتەیە کە کەشتی بە دەریادا هاتوچۆ پێ دەکات بۆتان، تا لە فەزڵ و بەخششی (بێشوماری) بەهرەوەر ببن، بەڕاستی ئەو زاتە هەمیشە و بەردەوام بەرەحم و میهرەبانە بۆتان.

وَإِذَا مَسَّكُمُ ٱلضُّرُّ فِي ٱلْبَحْرِ ضَلَّ مَن تَدْعُونَ إِلَّآ إِيَّاهُ فَلَمَّا نَجَّىٰكُمْ إِلَى ٱلْبَرِّ أَعْرَضْتُمْ وَكَانَ ٱلْإِنسَـٰنُ كَفُورًا ﴿٦٧﴾ أَفَأَمِنتُمْ أَن يَخْسِفَ بِكُمْ جَانِبَ ٱلْبَرِّ أَوْ يُرْسِلَ عَلَيْكُمْ حَاصِبًا ثُمَّ لَا تَجِدُوا۟ لَكُمْ وَكِيلًا ﴿٦٨﴾ أَمْ أَمِنتُمْ أَن يُعِيدَكُمْ فِيهِ تَارَةً أُخْرَىٰ فَيُرْسِلَ عَلَيْكُمْ قَاصِفًا مِّنَ ٱلرِّيحِ فَيُغْرِقَكُم بِمَا كَفَرْتُمْ ثُمَّ لَا تَجِدُوا۟ لَكُمْ عَلَيْنَا بِهِۦ تَبِيعًا ﴿٦٩﴾ ۞ وَلَقَدْ كَرَّمْنَا بَنِىٓ ءَادَمَ وَحَمَلْنَـٰهُمْ فِى ٱلْبَرِّ وَٱلْبَحْرِ وَرَزَقْنَـٰهُم مِّنَ ٱلطَّيِّبَـٰتِ وَفَضَّلْنَـٰهُمْ عَلَىٰ كَثِيرٍ مِّمَّنْ خَلَقْنَا تَفْضِيلًا ﴿٧٠﴾ يَوْمَ نَدْعُوا۟ كُلَّ أُنَاسٍۭ بِإِمَـٰمِهِمْ فَمَنْ أُوتِىَ كِتَـٰبَهُۥ بِيَمِينِهِۦ فَأُو۟لَـٰٓئِكَ يَقْرَءُونَ كِتَـٰبَهُمْ وَلَا يُظْلَمُونَ فَتِيلًا ﴿٧١﴾ وَمَن كَانَ فِى هَـٰذِهِۦٓ أَعْمَىٰ فَهُوَ فِى ٱلْـَٔاخِرَةِ أَعْمَىٰ وَأَضَلُّ سَبِيلًا ﴿٧٢﴾ وَإِن كَادُوا۟ لَيَفْتِنُونَكَ عَنِ ٱلَّذِىٓ أَوْحَيْنَآ إِلَيْكَ لِتَفْتَرِىَ عَلَيْنَا غَيْرَهُۥ وَإِذًا لَّٱتَّخَذُوكَ خَلِيلًا ﴿٧٣﴾ وَلَوْلَآ أَن ثَبَّتْنَـٰكَ لَقَدْ كِدتَّ تَرْكَنُ إِلَيْهِمْ شَيْـًٔا قَلِيلًا ﴿٧٤﴾ إِذًا لَّأَذَقْنَـٰكَ ضِعْفَ ٱلْحَيَوٰةِ وَضِعْفَ ٱلْمَمَاتِ ثُمَّ لَا تَجِدُ لَكَ عَلَيْنَا نَصِيرًا ﴿٧٥﴾



(٦٧) (خەڵكینە ئێوە)كاتێك لە دەریادا ناخۆشی و تەنگانە تووشتان دەبێت، ئەوە هەرچی پەرستراو هەیە لە بیروهۆش و باوەڕتاندا نامێنێت و ون دەبێت جگە لەو زاتە (هاناو هاوار هەر بۆ زاتی خوا دەبەن تا رزگارتان بكات) بەڵام كاتێك (فریاتان دەكەوێت) و رزگارتان دەكات و دەتانخاتە وشكانیەوە، ئێوە پشت لە بەرنامەكەی دەكەن و روو وەردەگێڕن و نایناسن، بەڵكو زۆربەی ئینسانەكان ناشوكرو سپڵەن.

(٦٨) خەڵكینە ئایا ئێوە لەخۆتان ئەمینن خوا نەتانبات بەناخی زەویداو لایەكی وشكانی نەڕوخێنێت بەسەرتاندا، یاخود بەرد بارانتان نەكات؟! لەوەودوا هیچ كەستان دەست ناكەوێت فریاتان بكەوێت و پەناتان بدات!!؟

(٦٩) ئایا دڵنیان و ناترسن لەوەی كە جارێكی تر لە كەشتیدا رێتان بكەوێتە ناو دەریاوە، ئەوسا بایەكی بەهێزی سەخت هەڵكاتە سەرتان، ئینجا بە هۆی كافر بوون و یاخی بوونتانەوە نوقمی دەریاتان بكات؟! لەوەودوا كەسیشتان دەست نەكەوێت بتوانێت داكۆكیتان لێ بكات لای ئێمە!!

(٧٠) سوێند بەخوا بەڕاستی ئێمە رێزمان لە نەوەی ئادەم گرتووە و بەسەر وشكانی و دەریادا (بەجۆرەها هۆكاری گواستنەوە) هەڵمان گرتوون و لە رزق و رۆزی پوخت و چاكی و جۆراو جۆر بەهرەوەرمان كردوون (لە خۆراك و پۆشاك و ماڵ و ناوماڵ و.. هتد) بەڕاستی ئێمە رێزی زیادەی ئەوانمان داوە بەسەر زۆربەی ئەو بەدی هێنراوانەدا كە دروستمان كردوون (لە هەموو روویەكەوە، تا قەدرو رێزی خۆیان بزانن).

(٧١) یادی ئەو رۆژە بكە كە هەموو كۆمەڵە خەڵكێك بەناوی پێشەواكەیانەوە بانگ دەكەین، جا ئەوەی نامە و دۆسیەی كردەوەكانی بدرێتە دەستی راستی، ئەوانە (بەخۆشیەوە) سەیری نامەی كردەوەكانی خۆیان دەكەن و دەیخوێننەوە و بەقەدەر تاڵە باریكەكەی ناوكی خورما ستەمیان لێ ناكرێت (كە شتێكی بێ نرخە).

(٧٢) جا ئەوەی لەم دنیایەدا (دڵ و دەروون و بیرو هۆشی) كوێر بێت، ئەوە لە قیامەتدا چاوی كوێرە و زۆر سەرگەردانترو سەرلێشێواوترە، چونكە چاوی سەری بۆ بینایی و تێفكران بەكار نەهێناوە لە دنیادا.

(٧٣) ئەی پێغەمبەر ﷺ موشریك و هاوەڵگەران خەریك بوو تۆ لابدەن لەوەی كە بەوەحی و نیگا بۆمان رەوانە كردوویت، تا شتێكی ترمان بۆ هەڵبەستیت و شێوازی كارو بانگەوازت بگۆڕیت، ئیتر ئەو كاتە ئەگەر بەقسەی ئەوان بكەیت ئەوان تۆ دەكەنە هاوەڵ و خۆشەویستی خۆیان (چونكە بەدڵی ئەوانت كردووە)!!.

(٧٤) خۆ ئەگەر ئێمە تۆمان پایەدارو دامەزراو نەكردایە، ئەوە بەڕاستی نزیك بوویت (بەمەزندەی خۆت، بۆ بەرژەوەندیی بانگەوازەكەت) كەمێك بە لایاندا مەیل بكەیت و بەدڵی ئەوان بكەیت!!

(٧٥) ئەو كاتە ئیتر دوو بەرامبەری (هاوەڵگەران) لە دنیاداو بە دوو بەرامبەری ئەوان لە دوای مردن سزاو ئازارمان پێ دەچەشتیت، پاشان كەسیشت نەدەكەوت فریات بكەوێت و لە دەستی ئێمە رزگارت بكات.

وَإِن كَادُواْ لَيَسْتَفِزُّونَكَ مِنَ ٱلْأَرْضِ لِيُخْرِجُوكَ مِنْهَا ۖ وَإِذًا لَّا يَلْبَثُونَ خِلَٰفَكَ إِلَّا قَلِيلًا ﴿٧٦﴾ سُنَّةَ مَن قَدْ أَرْسَلْنَا قَبْلَكَ مِن رُّسُلِنَا ۖ وَلَا تَجِدُ لِسُنَّتِنَا تَحْوِيلًا ﴿٧٧﴾ أَقِمِ ٱلصَّلَوٰةَ لِدُلُوكِ ٱلشَّمْسِ إِلَىٰ غَسَقِ ٱلَّيْلِ وَقُرْءَانَ ٱلْفَجْرِ ۖ إِنَّ قُرْءَانَ ٱلْفَجْرِ كَانَ مَشْهُودًا ﴿٧٨﴾ وَمِنَ ٱلَّيْلِ فَتَهَجَّدْ بِهِۦ نَافِلَةً لَّكَ عَسَىٰٓ أَن يَبْعَثَكَ رَبُّكَ مَقَامًا مَّحْمُودًا ﴿٧٩﴾ وَقُل رَّبِّ أَدْخِلْنِى مُدْخَلَ صِدْقٍ وَأَخْرِجْنِى مُخْرَجَ صِدْقٍ وَٱجْعَل لِّى مِن لَّدُنكَ سُلْطَٰنًا نَّصِيرًا ﴿٨٠﴾ وَقُلْ جَآءَ ٱلْحَقُّ وَزَهَقَ ٱلْبَٰطِلُ ۚ إِنَّ ٱلْبَٰطِلَ كَانَ زَهُوقًا ﴿٨١﴾ وَنُنَزِّلُ مِنَ ٱلْقُرْءَانِ مَا هُوَ شِفَآءٌ وَرَحْمَةٌ لِّلْمُؤْمِنِينَ ۙ وَلَا يَزِيدُ ٱلظَّٰلِمِينَ إِلَّا خَسَارًا ﴿٨٢﴾ وَإِذَآ أَنْعَمْنَا عَلَى ٱلْإِنسَٰنِ أَعْرَضَ وَنَـَٔا بِجَانِبِهِۦ ۖ وَإِذَا مَسَّهُ ٱلشَّرُّ كَانَ يَـُٔوسًا ﴿٨٣﴾ قُلْ كُلٌّ يَعْمَلُ عَلَىٰ شَاكِلَتِهِۦ فَرَبُّكُمْ أَعْلَمُ بِمَنْ هُوَ أَهْدَىٰ سَبِيلًا ﴿٨٤﴾ وَيَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلرُّوحِ ۖ قُلِ ٱلرُّوحُ مِنْ أَمْرِ رَبِّى وَمَآ أُوتِيتُم مِّنَ ٱلْعِلْمِ إِلَّا قَلِيلًا ﴿٨٥﴾ وَلَئِن شِئْنَا لَنَذْهَبَنَّ بِٱلَّذِىٓ أَوْحَيْنَآ إِلَيْكَ ثُمَّ لَا تَجِدُ لَكَ بِهِۦ عَلَيْنَا وَكِيلًا ﴿٨٦﴾

(٧٦) ئەو موشریکانە خەریکبوو زۆرت بۆ بهێنن و ئازارو ناخۆشیت بۆ پێش بهێنن تا لەسەر زەوی (مەککە) دەرت پەڕێنن و دەربەدەرت بکەن، ئەو کاتە ئیتر نەدەمانەوە دوای تۆ تەنها ماوەیەکی کەم نەبێت (زوو بە زوو بە بەڵایەکی سەخت لەناومان دەبردن).

(٧٧) (لەناوبردن) بڕیارو یاسای ئێمە بووە پێش تۆ(بۆ قەومە خوانەناسەکان) کاتێک پێغەمبەرانیان دەرکردبێت، بێگومان نابینیت سوننەت و بەرنامەی ئێمە گۆڕانی بەسەردا بێت.

(٧٨) (ئەی پێغەمبەرﷺ، ئەی ئیماندار) نوێژ ئەنجام بدە کاتێک خۆر نیوەی ئاسمان بەجێ دەهێڵێت (ئاماژەیە بۆ نوێژی نیوەڕۆو عەسر) لە تاریکی شەویشدا نوێژی (مەغریب و عیشا) ئەنجام بدە، نوێژی بەیانیانیش (کە زۆر قورئانی تێدا دەخوێنرێت فەرامۆشی مەکە) بەڕاستی قورئان خوێندنی نوێژی بەیانی دەبینرێت (لەلایەن فریشتەکانیشەوە).

(٧٩) لە بەشێکی شەوگاردا خۆت ماندوو بکە بە دەورکردنەوەی قورئانەوە لە شەونوێژدا کە زیادە ئەرکێکە لەسەر تۆ، ئەی پێغەمبەرﷺ، بۆ ئەوەی پەروەردگارت بتخاتە شوێن و جێگەی بەڕێزەوە کە تیایدا سوپاسکراو بیت.

(٨٠) بڵێ: پەروەردگارا یارمەتیم بدە تاهەرکاتێک دەستبەکاری (هەرخێرێک بووم) بەچاکی و ڕاستی و دروستی ئەنجامی بدەم و لە هەرکارێک بوومەوە و ئەنجامەمدا سەرەنجامێکی چاکی هەبێت وبەجوانی لێی دەرچم و هەمیشەو بەردەوام لەلایەن خۆتەوە دەسەڵاتێکم پێ ببەخشە کە ببێتە هۆی سەرکەوتنی بەردەوامم.

(٨١) هەروەها بڵێ: تازە ئیتر حەق و ڕاستی هاتووە و بەرپا بووە و بەتاڵ و ناحەقی، پووچ و تەفرو توونا بووە، بەڕاستی ناحەق و بەتاڵ هەرتیاچووە و جێگیر نەبووە و بەزیووە.

(٨٢) ئێمە لە قورئان ئایەت و سوورەتانێک دادەبەزێنین، کە ببێتە هۆی شیفاو چارەسەر بۆ نەخۆشیە دەروونی و جەستەییەکان هەروەها ڕەحمەت و میهرەبانیش، بۆ ئیمانداران، بۆ ستەمکارو خوانەناسانیش تەنها زیاد کرنی زەرەرو زیان نەبێت هیچی تر نیە، هیچ بەهرە و سوودێکی لی نابەن.

(٨٣) کاتێکیش ئازو نیعمەت ببەخشین بە ئینسانی (خوانەناس) ڕوو وەردەگێڕێت و فیز دەکات و هەر خەمخۆری خۆیەتی، کاتێکیش ناخۆشی و تەنگانەی تووش دێت، ئەوە نائومێد و پەست و غەمگین دەبێت.

(٨٤) بڵێ: هەموو کەس لەسەر سروشت و فیترەتی خۆی کاردەکات، جا پەروەردگارتان چاک دەزانێت کێ ڕێگەو ڕێبازو بەرنامەی ڕاست و دروستی گرتۆتە بەر.

(٨٥) پرسیارت لێ دەکەن دەربارەی ڕۆح (کە چیە و چۆنە؟) بڵێ: ڕۆح بەشێکە لە فەرمانی پەروەردگارم و بەدەست ئەوە (من نازانم چیە و چۆنە)و هیچتان پێنەبەخشراوە لە عیلم و زانست تەنها شتێکی کەم نەبێت.

(٨٦) سوێند بە خوا ئەگەر بمانەوێت هەموو ئەو قورئانەی کە بە وەحی بۆمان ڕەوانە کردوویت، ئەوە لە دڵ و دەروون و لاپەڕەکاندا نایهێڵین، پاشان کەسێکت دەست ناکەوێت بتپارێزێت و بەرگریت لێ بکات و هەوڵێکت بۆ بدات تا لەو بەهرەیە بێبەهرە نەبیت.

إِلَّا رَحْمَةً مِّن رَّبِّكَ ۚ إِنَّ فَضْلَهُۥ كَانَ عَلَيْكَ كَبِيرًا ﴿٨٧﴾ قُل لَّئِنِ ٱجْتَمَعَتِ ٱلْإِنسُ وَٱلْجِنُّ عَلَىٰٓ أَن يَأْتُوا۟ بِمِثْلِ هَـٰذَا ٱلْقُرْءَانِ لَا يَأْتُونَ بِمِثْلِهِۦ وَلَوْ كَانَ بَعْضُهُمْ لِبَعْضٍ ظَهِيرًا ﴿٨٨﴾ وَلَقَدْ صَرَّفْنَا لِلنَّاسِ فِى هَـٰذَا ٱلْقُرْءَانِ مِن كُلِّ مَثَلٍ فَأَبَىٰٓ أَكْثَرُ ٱلنَّاسِ إِلَّا كُفُورًا ﴿٨٩﴾ وَقَالُوا۟ لَن نُّؤْمِنَ لَكَ حَتَّىٰ تَفْجُرَ لَنَا مِنَ ٱلْأَرْضِ يَنۢبُوعًا ﴿٩٠﴾ أَوْ تَكُونَ لَكَ جَنَّةٌ مِّن نَّخِيلٍ وَعِنَبٍ فَتُفَجِّرَ ٱلْأَنْهَـٰرَ خِلَـٰلَهَا تَفْجِيرًا ﴿٩١﴾ أَوْ تُسْقِطَ ٱلسَّمَآءَ كَمَا زَعَمْتَ عَلَيْنَا كِسَفًا أَوْ تَأْتِىَ بِٱللَّهِ وَٱلْمَلَـٰٓئِكَةِ قَبِيلًا ﴿٩٢﴾ أَوْ يَكُونَ لَكَ بَيْتٌ مِّن زُخْرُفٍ أَوْ تَرْقَىٰ فِى ٱلسَّمَآءِ وَلَن نُّؤْمِنَ لِرُقِيِّكَ حَتَّىٰ تُنَزِّلَ عَلَيْنَا كِتَـٰبًا نَّقْرَؤُهُۥ ۗ قُلْ سُبْحَانَ رَبِّى هَلْ كُنتُ إِلَّا بَشَرًا رَّسُولًا ﴿٩٣﴾ وَمَا مَنَعَ ٱلنَّاسَ أَن يُؤْمِنُوٓا۟ إِذْ جَآءَهُمُ ٱلْهُدَىٰٓ إِلَّآ أَن قَالُوٓا۟ أَبَعَثَ ٱللَّهُ بَشَرًا رَّسُولًا ﴿٩٤﴾ قُل لَّوْ كَانَ فِى ٱلْأَرْضِ مَلَـٰٓئِكَةٌ يَمْشُونَ مُطْمَئِنِّينَ لَنَزَّلْنَا عَلَيْهِم مِّنَ ٱلسَّمَآءِ مَلَكًا رَّسُولًا ﴿٩٥﴾ قُلْ كَفَىٰ بِٱللَّهِ شَهِيدًۢا بَيْنِى وَبَيْنَكُمْ ۚ إِنَّهُۥ كَانَ بِعِبَادِهِۦ خَبِيرًۢا بَصِيرًا ﴿٩٦﴾

(٨٧) (بەڵام ئێمە ئەو کارە ناکەین) چونکە ئەمە رەحمەتێکە لەلایەن پەروەردگارتەوە، بەڕاستی فەزڵ و بەخشندەی ئەو زاتە (بۆ تۆو بۆ هەموو ئیمانداریک) زۆر گەورە و فراوانە.

(٨٨) ئەی محمد ﷺ پێیان بڵێ: سوێند بە خوا ئەگەر هەموو ئادەمیزاد و پەریەکان کۆ ببنەوە و (هەوڵی بەردەوام بدەن تا) قورئانێکی وەکو ئەمە دانێن و بیهێننە (مەیدان) ناتوانن کاری وابکەن و ناتوانن لە وێنەی بهێنن، ئەگەر چی هەموو لایەکیان ببنە پشتگیرو یارمەتیدەری یەکتر.

(٨٩) سوێند بە خوا بێگومان ئێمە لەم قورئانەدا لە هەموو جۆرە نموونەیەکمان بۆ خەڵکی هێناوەتەوە (تا تێفکرن و بیر بکەنەوە) کەچی زۆربەی خەڵکی تەنها ڕێبازی کوفرو خوانەناسی نەبێت هیچی تر وەرناگرن...

(٩٠) (هەندێکیان بیانوویان گرت و) وتیان: هەرگیز ئێمە باوەڕ بە تۆ ناکەین تا کانی و سەرچاوەیەکمان لە زەویەوە بۆ هەڵنەقوڵێنیت.

(٩١) یاخود دەبێت خاوەنی باخێک بیت کە پڕ بێت لە دارخورماو رەزو چەندەها رووبار لەناویدا هەڵبقوڵێنیت و بەخوڕو رەوان بەژێریاندا بڕوات.

(٩٢) یاخود ئاسمان پارچەپارچە بەسەرماندا، هەر وەکوخۆت پڕوپاگەندە دەکەی دابارێنە، یاخود خوای گەورەو فریشتەکانی بهێنەو روو بەڕوومانی بکە!!

(٩٣) یان کۆشک و تەلارو ماڵێکت هەبێت کە بە (ئاڵتون و زیوو شتی جوان) نەخشێنرابێت و زەخرەفە کرابێت، یان (ببینین)کە بەرەو ئاسمان بڵندو بەرز دەبیتەوە، ئێمە هەرگیز بەوەش باوەڕ ناکەین هەتا کتێبێک دانەبەزێنیت و بیخوێنینەوە، تۆش پێیان بڵێ: پاکی و بێگەردی بۆ پەروەردگارم.. (باشە، کەی ئەوانە لە دەست مندایە) من تەنها پێغەمبەرێکم لەگرۆی ئادەمیزادو هیچی تر نیم (ئێوەش لەو ئاستەدا نین ئەو بیانوانەتان جێبەجێ بکەین).

(٩٤) هیچ شتێک نەبووەتە کۆسپ لە ڕێگەی ئەوەدا خەڵکی باوەڕ بهێنن - کاتێک هیدایەتیان بۆ هات - تەنها ئەوە نەبێت کە وتیان: ئایا خوا مرۆڤێکی بە فرستادە ناردووە؟! (لەباتی ئەوەی زوو بەدەم بانگەوازی خواوە بچن و ئەوە بەڕێز بۆ خۆیان بزانن، کە نوێنەریان لێ هەڵدەبژێرێت و ئیمانی پێ بهێنن، زۆربەی خەڵکی لە سەردەمەکانی پێشوودا عەقڵیان کول بووە لە ئاستی ئەو ڕێزە تایبەتیەدا).

(٩٥) پێیان بڵێ: ئەگەر لەسەر زەویدا فریشتە هەبوونایە و بەدڵنیاییەوە هاتوچۆیان بکردایە و ژیانیان ببردایەتە سەر، ئەوە ئێمە هەر لە ئاسمانەوە فریشتەیەکمان دادەبەزاندە سەریان کە پێغەمبەرو فرستادە بێت بۆیان (چونکە فرستادە دەبێت لە جۆری خۆیان بێت).

(٩٦) بڵێ: هەر خوا بەسە کە شایەت بێت لە نێوان من و ئێوەدا کە چۆن بە ڕێکوپێکی پەیامی پەروەردگارم پێ ڕاگەیاندوون، بەڕاستی ئەو زاتە هەمیشە بە بەندەکانی ئاگادارو بینایە.



وَمَن يَهْدِ ٱللَّهُ فَهُوَ ٱلْمُهْتَدِ ۖ وَمَن يُضْلِلْ فَلَن تَجِدَ لَهُمْ أَوْلِيَآءَ مِن دُونِهِۦ ۖ وَنَحْشُرُهُمْ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ عَلَىٰ وُجُوهِهِمْ عُمْيًا وَبُكْمًا وَصُمًّا ۖ مَّأْوَىٰهُمْ جَهَنَّمُ ۖ كُلَّمَا خَبَتْ زِدْنَٰهُمْ سَعِيرًا ﴿٩٧﴾ ذَٰلِكَ جَزَآؤُهُم بِأَنَّهُمْ كَفَرُوا۟ بِـَٔايَٰتِنَا وَقَالُوٓا۟ أَءِذَا كُنَّا عِظَٰمًا وَرُفَٰتًا أَءِنَّا لَمَبْعُوثُونَ خَلْقًا جَدِيدًا ﴿٩٨﴾ ۞ أَوَلَمْ يَرَوْا۟ أَنَّ ٱللَّهَ ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ قَادِرٌ عَلَىٰٓ أَن يَخْلُقَ مِثْلَهُمْ وَجَعَلَ لَهُمْ أَجَلًا لَّا رَيْبَ فِيهِ فَأَبَى ٱلظَّٰلِمُونَ إِلَّا كُفُورًا ﴿٩٩﴾ قُل لَّوْ أَنتُمْ تَمْلِكُونَ خَزَآئِنَ رَحْمَةِ رَبِّىٓ إِذًا لَّأَمْسَكْتُمْ خَشْيَةَ ٱلْإِنفَاقِ ۚ وَكَانَ ٱلْإِنسَٰنُ قَتُورًا ﴿١٠٠﴾ وَلَقَدْ ءَاتَيْنَا مُوسَىٰ تِسْعَ ءَايَٰتٍۭ بَيِّنَٰتٍ ۖ فَسْـَٔلْ بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ إِذْ جَآءَهُمْ فَقَالَ لَهُۥ فِرْعَوْنُ إِنِّى لَأَظُنُّكَ يَٰمُوسَىٰ مَسْحُورًا ﴿١٠١﴾ قَالَ لَقَدْ عَلِمْتَ مَآ أَنزَلَ هَٰٓؤُلَآءِ إِلَّا رَبُّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ بَصَآئِرَ وَإِنِّى لَأَظُنُّكَ يَٰفِرْعَوْنُ مَثْبُورًا ﴿١٠٢﴾ فَأَرَادَ أَن يَسْتَفِزَّهُم مِّنَ ٱلْأَرْضِ فَأَغْرَقْنَٰهُ وَمَن مَّعَهُۥ جَمِيعًا ﴿١٠٣﴾ وَقُلْنَا مِنۢ بَعْدِهِۦ لِبَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ ٱسْكُنُوا۟ ٱلْأَرْضَ فَإِذَا جَآءَ وَعْدُ ٱلْـَٔاخِرَةِ جِئْنَا بِكُمْ لَفِيفًا ﴿١٠٤﴾

(٩٧) ئەوکەسەش خوا رێنموویی بکات و (شایستە بێت) ئەوە ئیتر هیدایەت دراوە و رێنموویی وەرگرتووە، ئەوەش کە سەرگەردانی بکات، ئەوە هەرگیز کەسێکت دەست ناکەوێت جگە لەو زاتە کە پشتیوانی بکات و رزگاری بکات و فریای بکەوێت، لە رۆژی قیامەتیشدا (ئەو جۆرە کەسانە) لەسەر روو کۆدەکەینەوەو لەکاتێکدا کوێرو لاڵ وکەڕن، ئەوانە شوێنیان ناو ئاگری دۆزەخە، هەر کاتێک بڵێسەی کوژایەوە، بڵێسەی زیاد دەکەینەوە بۆیان.

(٩٨) ئەو دۆزەخە پاداشتیانە چونکە بەڕاستی ئەوانە بڕوایان بەئایەت و فەرمانەکانی ئێمە نەبوو (لە بوونەوەرو لە قورئاندا) دەشیانوت: باشە، ئایا ئەگەر ئێمە بووینە ئێسک و پرتووکاین، ئایا ئێمە بەڕاستی جارێکی تر سەرلەنوێ زیندوودەکرێینەوە؟!

(٩٩) ئایا ئەوانە نەیانبینووە بەڕاستی ئەو خوایەی کە ئاسمانەکان و زەوی دروست کردووە بەتوانایە کە وەک ئەوان دروست بکات و (وەک خۆیان بەدیان بهێنێتەوە)، دیارە کە رۆژو کاتێکی تایبەتی دیاری کردووە (بۆ مراندنیان و زیندووکردنەوەیان) کە هیچ گومانی تێدا نیە (لەگەڵ ئەو بەڵگە بەهێزانەدا) کەچی ستەمکاران هەر بڕیاری یاخی بوون و سەرکەشی و کوفریانداوە و هیچی تر.

(١٠٠) پێیان بڵێ: ئەگەر ئێوە خاوەنی گەنجینەکانی بەخشین و رەحمەتی پەروەردگارم بن، ئەوکاتە دەستان دەگرتەوە لە ترسی بەخشین، ئادەمیزادیش دەست نوقاوو رەزیلە (ئەگەر پەروەردەی خوایی نەبێت).

(١٠١) سوێند بە خوا بێگومان ئێمە نۆ موعجیزەو بەڵگە و نیشانەی ئاشکرامان بە موسا بەخشی، (جا ئەی پێغەمبەر ﷺ لە نەوەی ئیسرائیلی (زەمانی خۆت) بپرسە کاتێک موسایان بۆ هات (چیان وت؟) جا فیرعەون پێی وت: ئەی موسا بەڕاستی من واگومان دەبەم کە تۆ جادووت لێکراوە.

(١٠٢) موسا وتی: سوێند بە خوا (ئەی فیرعەون) تۆ چاک زانیوتە کە ئەو (معجزانە) کەس ئاوا پێشی ناهێنێت جگە لە پەروەردگاری ئاسمانەکان و زەوی، تا بەرچاو روونکەرەوە بێت و (خەڵکی بەرۆشنی حەق و ناحەق ببینن و لە یەکی جیا بکەنەوە) و من دڵنیام بەڕاستی ئەی فیرعەون کە تۆ تیا دەچیت و لەناو دەبرێیت (ئەگەر هەر ئاوا بیر بکەیتەوە).

(١٠٣) جا فیرعەون ویستی لەسەر زەوی میسر بەیەکجاری و بەسوکایەتی کردنەوە دەریەدەریان بکات، ئێمەش نوقمی دەریامان کرد، خۆی و هەرچی ئەوانەی کە لەگەڵیدا بوون.

(١٠٤) لەدوای لەناوبردنیشی فەرمانماندا بەنەوەی ئیسرائیل و وتمان: کە لەسەر زەوی (فەلەستین) نیشتەجێ ببن (کاتێک بەتەواوی رێبازی خوایان گرتەبەرو، ئیمانداری چاک و پاکی زۆریان تێدا هەڵکەوت، هەندێ جار پێغەمبەرەکانیان فەرمانڕەوایەتیان دەکردن، وەک لە سەردەمی حەزرەتی داودو سلێماندا بووە، بەڵام بەداخەوە جوولەکەی ئەم سەردەمە رێبازی دوژمنایەتی هەموو خەڵکیان گرتۆتە بەر، بە تایبەتی ئوممەتی ئیسلام، بەڵام بە پشتیوانی خوای گەورە کۆتایی هێنان بە دەسەڵاتیان نزیکە)، کاتێک بەڵێنی دوایی هات دەستە دەستە و پۆل پۆل (لەسەر زەوی فەلەستین) کۆتان دەکەینەوە.

وَبِالْحَقِّ أَنزَلْنَٰهُ وَبِالْحَقِّ نَزَلَ وَمَآ أَرْسَلْنَٰكَ إِلَّا مُبَشِّرًا وَنَذِيرًا ﴿١٠٥﴾
وَقُرْءَانًا فَرَقْنَٰهُ لِتَقْرَأَهُۥ عَلَى ٱلنَّاسِ عَلَىٰ مُكْثٍ وَنَزَّلْنَٰهُ تَنزِيلًا ﴿١٠٦﴾
قُلْ ءَامِنُوا۟ بِهِۦٓ أَوْ لَا تُؤْمِنُوٓا۟ إِنَّ ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْعِلْمَ مِن قَبْلِهِۦٓ إِذَا يُتْلَىٰ
عَلَيْهِمْ يَخِرُّونَ لِلْأَذْقَانِ سُجَّدًا ﴿١٠٧﴾ وَيَقُولُونَ سُبْحَٰنَ رَبِّنَآ إِن كَانَ
وَعْدُ رَبِّنَا لَمَفْعُولًا ﴿١٠٨﴾ وَيَخِرُّونَ لِلْأَذْقَانِ يَبْكُونَ وَيَزِيدُهُمْ
خُشُوعًا ۩ ﴿١٠٩﴾ قُلِ ٱدْعُوا۟ ٱللَّهَ أَوِ ٱدْعُوا۟ ٱلرَّحْمَٰنَ أَيًّا مَّا تَدْعُوا۟ فَلَهُ



ٱلْأَسْمَآءُ ٱلْحُسْنَىٰ وَلَا تَجْهَرْ بِصَلَاتِكَ وَلَا تُخَافِتْ بِهَا وَٱبْتَغِ
بَيْنَ ذَٰلِكَ سَبِيلًا ﴿١١٠﴾ وَقُلِ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ ٱلَّذِى لَمْ يَتَّخِذْ وَلَدًا وَلَمْ يَكُن
لَّهُۥ شَرِيكٌ فِى ٱلْمُلْكِ وَلَمْ يَكُن لَّهُۥ وَلِىٌّ مِّنَ ٱلذُّلِّ وَكَبِّرْهُ تَكْبِيرًۢا ﴿١١١﴾

## سُورَةُ الكَهْفِ

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ



ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ ٱلَّذِىٓ أَنزَلَ عَلَىٰ عَبْدِهِ ٱلْكِتَٰبَ وَلَمْ يَجْعَل لَّهُۥ عِوَجَا ﴿١﴾
قَيِّمًا لِّيُنذِرَ بَأْسًا شَدِيدًا مِّن لَّدُنْهُ وَيُبَشِّرَ ٱلْمُؤْمِنِينَ ٱلَّذِينَ
يَعْمَلُونَ ٱلصَّٰلِحَٰتِ أَنَّ لَهُمْ أَجْرًا حَسَنًا ﴿٢﴾ مَّٰكِثِينَ
فِيهِ أَبَدًا ﴿٣﴾ وَيُنذِرَ ٱلَّذِينَ قَالُوا۟ ٱتَّخَذَ ٱللَّهُ وَلَدًا ﴿٤﴾

(١٠٥) ئێمە قورئانمان لەسەربنچینەی حەق و ڕاستی دابەزاندووە، بۆ چەسپاندنی حەق و ڕاستیتیش دابەزیوە ، ئێمە تۆمان ڕەوانە نەکردووە تەنها بۆ ئەوە نەبێت کە مژدە بەخش بیت (بە ئیمانداران) و ترسێنەر بیت (بۆ خوانەناسان).

(١٠٦) ئێمە قورئانیشمان بەش بەش کردووە تا بە شێنەیی و بە ئارامی بیخوێنیتەوە بەسەر خەڵکیدا، هەر ئێمەش بەو شێوەیە دامانبەزاندووە (کە تۆ ڕایدەگەیەنیت).

(١٠٧) پێیان بڵێ: (ئەی خوانەناسان) باوەڕ بە قورئان بهێنن یان باوەڕی پێ نەهێنن (بەدەست خۆتانە و ئەمڕۆ سەربەستن، بەڵام بزانن) بەڕاستی ئەوانەی پێشتر زانیاریان پێدراوە (دەربارەی تەورات و ئینجیلی دەستکاری نەکراو، چاک دەزانن کە ئەم قورئانە لە هەمان سەرچاوەوەیە، هەر بۆیە) کاتێک بەسەریاندا دەخوێندرێتەوە (خۆیان پێناگیرێت) خێرا سەری ڕێزو نەوازشی بۆ دادەنەوێنن و سوژدە (بۆ نێرەری قورئان دەبەن).

(١٠٨) دەشڵێن: پاکی و بێگەردی بۆ پەروەردگارمانە، بەڕاستی بەڵێنی پەروەردگارمان هەر دێتە دی (بەسەرخستنی ئیمانداران لە دنیادا و سەرفرازیان لە قیامەتدا).

(١٠٩) ئەوانە سوژدە وکڕنووش دەبەن و دەگرین و ئەسرینی خۆشەویستی پەروەردگار لە چاوانیان دەبارێت، فرمێسکی ئیمان و شادی هەڵدەوەرێنن و تا دێت زیاتر ملکەچ و فەرمانبەردار و دڵ پڕ لە ئیمان دەبن.

(١١٠) پێیان بڵێ: ئێوە لە نزاو دوعاتاندا هاوار لە (الله) بکەن، یان بە سیفەتی پیرۆزی (الرحمن) هانای بۆ بەرن، بەهەر ناو سیفەتێکی جوان و بەرز هاواری لێبکەن و نزا بکەن دروستە، چونکە ئەو خاوەنی هەموو سیفات و ناوە پیرۆزو جوانەکانە، بەهەر سیفەتێک کە لەگەڵ داخوازیەکانتاندا گونجا، داوای لێ بکەن، لەکاتی داواکردنی رزق و ڕۆزیدا بە (یا رزاق، یا وهاب) لەکاتی داوای سەرکەوتندا بە (یا قوي یا متین یاعزیز یا ...هتد، ئەی ئیماندار) لەکاتی خوێندنی قورئان لە نوێژەکاندا دەنگ بەرز مەکە و زۆریش نزمی مەکە، لەو نێوانەدا حاڵەتێکی لەبارو مامناوەندی ئەنجام بدە.

(١١١) بشڵێ: سوپاس و ستایش بۆ ئەو خوایەی کە کەسی نەکردووە بەڕۆڵەی خۆی و ڕۆڵەشی هەر نییە، هەروەها لە موڵک و مەملەکەتیدا کەسی نەکردووە بە شەریک و هاوتای خۆی، هەرگیز بەهۆی بێ دەسەڵاتی و کەم توانینەوە کەسی نەکردووە بە یاوەرو یاریدەدەری خۆی، (لەبەرئەوە) هەمیشە (الله أكبر) بڵێ و ئەو زاتە بەگەورە و مەزن بزانە.

## سورەتی (الکهف)

بەناوی خوای بەخشندە و میهرەبان

(١) سوپاس و ستایش بۆ ئەو خوایەی ئەم کتێبە کە قورئانە بۆ سەر بەندەی خۆی (محمد ﷺ) دابەزاندووە، هیچ کەم و کووڕی و ناتەواویەکیشی بۆ ڕەوا نەداوە.

(٢) کردوویەتی بەچاودێری هەرچی بەرژەوەندیەکانی ئادەمیزادە و ڕێک و ڕاستە لە هەموو شتێکدا، بۆ ئەوەی یاخیەکان لە سزایەکی سەخت بێدار بکاتەوە کە لەلایەن خواوە (لە دنیاو قیامەتدا) یەخەیان پێ دەگرێت و مژدەش بدات بەو ئیماندارانەی کە کارو کردەوە چاکەکان ئەنجام دەدەن بەوەی کە بەڕاستی پاداشتی زۆر چاکیان بۆ ئامادەیە.

(٣) بەردەوام و بۆ هەمیشە لەو بەهەشتە سازگارەدا دەمێننەوە.

(٤) هەروەها بۆ ئەوەی ئەوانە بترسێنێت و بێداریان دەکاتەوە، کە دەیانوت: خوا منداڵی بۆ خۆی بڕیارداوە!!

مَّا لَهُم بِهِۦ مِنْ عِلْمٍ وَلَا لِـَٔابَآئِهِمْ ۚ كَبُرَتْ كَلِمَةً تَخْرُجُ مِنْ أَفْوَٰهِهِمْ ۚ إِن يَقُولُونَ إِلَّا كَذِبًا ﴿٥﴾ فَلَعَلَّكَ بَٰخِعٌ نَّفْسَكَ عَلَىٰٓ ءَاثَٰرِهِمْ إِن لَّمْ يُؤْمِنُوا۟ بِهَٰذَا ٱلْحَدِيثِ أَسَفًا ﴿٦﴾ إِنَّا جَعَلْنَا مَا عَلَى ٱلْأَرْضِ زِينَةً لَّهَا لِنَبْلُوَهُمْ أَيُّهُمْ أَحْسَنُ عَمَلًا ﴿٧﴾ وَإِنَّا لَجَٰعِلُونَ مَا عَلَيْهَا صَعِيدًا جُرُزًا ﴿٨﴾ أَمْ حَسِبْتَ أَنَّ أَصْحَٰبَ ٱلْكَهْفِ وَٱلرَّقِيمِ كَانُوا۟ مِنْ ءَايَٰتِنَا عَجَبًا ﴿٩﴾ إِذْ أَوَى ٱلْفِتْيَةُ إِلَى ٱلْكَهْفِ فَقَالُوا۟ رَبَّنَآ ءَاتِنَا مِن لَّدُنكَ رَحْمَةً وَهَيِّئْ لَنَا مِنْ أَمْرِنَا رَشَدًا ﴿١٠﴾ فَضَرَبْنَا عَلَىٰٓ ءَاذَانِهِمْ فِى ٱلْكَهْفِ سِنِينَ عَدَدًا ﴿١١﴾ ثُمَّ بَعَثْنَٰهُمْ لِنَعْلَمَ أَىُّ ٱلْحِزْبَيْنِ أَحْصَىٰ لِمَا لَبِثُوٓا۟ أَمَدًا ﴿١٢﴾ نَّحْنُ نَقُصُّ عَلَيْكَ نَبَأَهُم بِٱلْحَقِّ ۚ إِنَّهُمْ فِتْيَةٌ ءَامَنُوا۟ بِرَبِّهِمْ وَزِدْنَٰهُمْ هُدًى ﴿١٣﴾ وَرَبَطْنَا عَلَىٰ قُلُوبِهِمْ إِذْ قَامُوا۟ فَقَالُوا۟ رَبُّنَا رَبُّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ لَن نَّدْعُوَا۟ مِن دُونِهِۦٓ إِلَٰهًا ۖ لَّقَدْ قُلْنَآ إِذًا شَطَطًا ﴿١٤﴾ هَٰٓؤُلَآءِ قَوْمُنَا ٱتَّخَذُوا۟ مِن دُونِهِۦٓ ءَالِهَةً ۖ لَّوْلَا يَأْتُونَ عَلَيْهِم بِسُلْطَٰنٍ بَيِّنٍ ۖ فَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّنِ ٱفْتَرَىٰ عَلَى ٱللَّهِ كَذِبًا ﴿١٥﴾

(٥) جا ئەوانە ئەخۆیان و ئەباوو باپرانیان لە رووی زانست و زانیاری و تێگەیشتنەوە ئەو گوفتارە ناقۆڵایە نالێن، ئەو بوختانەیان قسەیەکی زۆر گەورە و نارێکە کە لە دەمیان دەردەچێت، ئەوانە جگە لە درۆو گوفتاری نابەجێ هیچی تر نالێن.

(٦) جا تۆ لەوانەیە لە خەم و پەژارەدا لە سەرەنجامی رەشی ئەوانەی کە باوەڕ بەم قورئان و فەرمودەیە ناهێنن خۆت لەناو بەریت و لە داخ و خەفەتدا بمریت.

(٧) بێگومان ئێمە هەرچی لەسەر رووی زەویدا هەیە کردوومانە بەهۆی رازاندنەوەی، تا تاقیان بکەینەوە کامیان کارو کردەوەی چاکترو رێک و پێک تر ئەنجام دەدات (نازو نیعمەتەکان بۆ چاکە بەکار دەهێنێت).

(٨) بێگومان ئێمە سەرئەنجام هەرچی لەسەر ئەم زەویەدا هەیە تەختی دەکەین و دەیکەینە گۆرەپانێکی وشک و برنگ و ساف.

(٩) (بەڵگەیەکی تر لەسەر زیندوو بوونەوە ئەوەیە کە خوای گەورە دەیپرسێت) ئایا وا دانانێیت کە بە راستی یارانی ئەشکەوت و تابلۆ (کە ناویانی لەسەر نووسراوە) لە نیشانەو بەڵگە سەرسوڕهێنەرەکانی ئێمەن؟! (لە سەردەمی پاشایەکی زۆرداری خوانەناسدا چەند لاوێکی ئیماندار هەست دەکەن کە ئیمان و ژیانیان لە مەترسیدایە بۆیە روو دەکەنە ئەشکەوتێک، لەوێدا ماوەیەکی دوورو درێژ خوای گەورە خەویان لێ دەخات)...

(١٠) کاتێک لاوەکان پەنایان بردە بەرئەشکەوتەکە و نزایان کرد، جا وتیان: پەروەردگارا لەلایەن خۆتەوە رەحمەت و میهرەبانی تایبەتیمان پێ ببخشە و لە سۆزی خۆت بەهرەوەرمان بکەو رێگەی رزگاری و سەرفرازیمان بۆ بسازێنە لەم کارەماندا.

(١١) ئینجا (ئێمەش نزامان گیراکردن) پەردەمان هێنا بەسەر گوێیاندا، (تا بەئارامی) چەندەها ساڵ لە ئەشکەوتەکەدا بۆ خۆیان (بە خەوتوویی) بمێننەوە.

(١٢) پاشان (دوای ماوەیەکی دوور و درێژ) لە خەو خەبەرمان کردنەوە و لە نوستن هەستان، تا بزانین کام دەستەیەیان دەزانن کە چەندە خەویان لێکەوتووە (ئەوانەیان کە دەڵێن رۆژێک یان کەمتر، یان ئەوانەیان کە دەڵێن مەگەر هەر خوا بزانێت چەندە خەوتووین).

(١٣) ئێمە بەڕاستی و دروستی هەواڵی بەسەرهاتی ئەو لاوانەت بۆ دەگێڕینەوە، بەڕاستی ئەوانە لاوانێک بوون باوەڕی دامەزراویان هێنابوو بە پەروەردگاریان، ئێمەش زیاتر لە نووری ئیمان و هیدایەت بەهرەوەرمان کردن.

(١٤) ئێمەش دڵەکانیانمان دامەزراو کردو ترسمان تێدا نەهێشت (بڕیاریاندا کۆمەڵگەی نەفامی بەجێبهێڵن) کاتێک هەستان و وتیان: پەروەردگاری ئێمە پەروەردگاری ئاسمانەکان و زەویە، هەرگیز هاناو هاوار بۆ هیچ خوایەکی تر نابەین جگە لەو، ئەگەر لەو راستیە لابدەین، سوێند بە خوا ئەوە بێگومان ئێمە لەو کاتەدا قسەی نابەجێ و نادروستمان کردووە.

(١٥) ئا ئەوانە قەومەکەی خۆمانن (لە رێبازی راست لایانداوە لەجیاتی خواناسی) شتی تریان کردووە بە خوای خۆیان، دەبا بەڵگەیەکی ئاشکراش بهێنن لەسەریان، جا کێ ستەمکارترە لەوەی کە درۆ بۆ خوا هەڵدەبەستێت؟!



وَإِذِ ٱعْتَزَلْتُمُوهُمْ وَمَا يَعْبُدُونَ إِلَّا ٱللَّهَ فَأْوُۥٓا۟ إِلَى ٱلْكَهْفِ يَنشُرْ لَكُمْ رَبُّكُم مِّن رَّحْمَتِهِۦ وَيُهَيِّئْ لَكُم مِّنْ أَمْرِكُم مِّرْفَقًا ﴿١٦﴾ ۞ وَتَرَى ٱلشَّمْسَ إِذَا طَلَعَت تَّزَٰوَرُ عَن كَهْفِهِمْ ذَاتَ ٱلْيَمِينِ وَإِذَا غَرَبَت تَّقْرِضُهُمْ ذَاتَ ٱلشِّمَالِ وَهُمْ فِى فَجْوَةٍ مِّنْهُ ۚ ذَٰلِكَ مِنْ ءَايَٰتِ ٱللَّهِ ۗ مَن يَهْدِ ٱللَّهُ فَهُوَ ٱلْمُهْتَدِ ۖ وَمَن يُضْلِلْ فَلَن تَجِدَ لَهُۥ وَلِيًّا مُّرْشِدًا ﴿١٧﴾ وَتَحْسَبُهُمْ أَيْقَاظًا وَهُمْ رُقُودٌ ۚ وَنُقَلِّبُهُمْ ذَاتَ ٱلْيَمِينِ وَذَاتَ ٱلشِّمَالِ ۖ وَكَلْبُهُم بَٰسِطٌ ذِرَاعَيْهِ بِٱلْوَصِيدِ ۚ لَوِ ٱطَّلَعْتَ عَلَيْهِمْ لَوَلَّيْتَ مِنْهُمْ فِرَارًا وَلَمُلِئْتَ مِنْهُمْ رُعْبًا ﴿١٨﴾ وَكَذَٰلِكَ بَعَثْنَٰهُمْ لِيَتَسَآءَلُوا۟ بَيْنَهُمْ ۚ قَالَ قَآئِلٌ مِّنْهُمْ كَمْ لَبِثْتُمْ ۖ قَالُوا۟ لَبِثْنَا يَوْمًا أَوْ بَعْضَ يَوْمٍ ۚ قَالُوا۟ رَبُّكُمْ أَعْلَمُ بِمَا لَبِثْتُمْ فَٱبْعَثُوٓا۟ أَحَدَكُم بِوَرِقِكُمْ هَٰذِهِۦٓ إِلَى ٱلْمَدِينَةِ فَلْيَنظُرْ أَيُّهَآ أَزْكَىٰ طَعَامًا فَلْيَأْتِكُم بِرِزْقٍ مِّنْهُ وَلْيَتَلَطَّفْ وَلَا يُشْعِرَنَّ بِكُمْ أَحَدًا ﴿١٩﴾ إِنَّهُمْ إِن يَظْهَرُوا۟ عَلَيْكُمْ يَرْجُمُوكُمْ أَوْ يُعِيدُوكُمْ فِى مِلَّتِهِمْ وَلَن تُفْلِحُوٓا۟ إِذًا أَبَدًا ﴿٢٠﴾

(١٦) (هەندێكیان وتیان) جا ئێستە كە ئێوە بڕیارتانداوە خۆتان دوورە پەرێزبگرن لەم خەڵكەو لەوشتانە كەلە جیاتی خوا دەیانپەرستن، تەنها خواپەرستی بكەن، دە پەنا بەرنە ئەشكەوتەكە، ئەوكاتە پەروەردگارتان رەحمەت و میهرەبانی خۆیتان بەسەردا پەخش دەكاتەوە و هۆكاری حەوانەوەتان بۆ دابین دەكات.

(١٧) كاتێكیش كە خۆر هەڵدێت، تیشكەكەی دەبینیت لە لای راستی ئەشكەوتەكەوە دەدات و تێپەڕ دەبێت، كاتێكیش كە ئاوا دەبێت لە لای چەپی دەدات و تیشكەكەیان بەسەردا تێپەڕ دەبێت، لەو كاتەدا ئەو لاوانە لەناو بۆشایی فراوانی ئەشكەوتەكەدا راكشاون، ئەوە هەمووی بەڵگە و نیشانەیەكە لە بەڵگەو نیشانەكانی خوا ، ئەوەی خوا هیدایەتی بدات هەر ئەو هیدایەت دراوەو رێنموویی وەرگرتووە، ئەوەش خوا گومڕای بكات، ئەوە هەرگیز كەسێكت دەست ناكەوێت كە پشتیوانی بكات و رێنموویی بكات.

(١٨) (پاشان دیمەنیان دەهێنێتە بەرچاو و دەفەرموێت): وادەزانیت بەخەبەرن لەكاتێكدا بەخەوتویی راكشاون، ئێمە ئەم دیوو ئەو دیویان پێدەكەین و بەلای راست و بەلای چەپیاندا هەڵیان دەگێڕینەوە (بۆ ئەوەی زەوی جەستەیان نەخوات و هەوای پاك لێیان بدات)، سەگەكەشیان چەمۆڵەی داداوە لەبەردەم كەلەبەری ئەشكەوتەكەدا، ئەگەر تۆ (ئەی پێغەمبەرﷺ، ئەی ئیماندار) سەرێكت بكێشایە بۆ سەر دیمەنیان، ئەوە بە پەلە هەڵدەهاتیت و ترسێكی زۆر لە دیمەنیان دەچووە دڵتەوە.

(١٩) هەر بەو شێوەیەش كە بەدەسەڵاتی خۆمان خەومان لێخستن، خەبەرمان كردنەوە، بۆ ئەوەی (لە ماوەی خەوتنەكەیان) لەیەكتر بپرسن، یەكێكیان وتی: باشە ئەوە ئێوە وادەزانن چەندە خەوتوون، هەندێكیان وتیان: رۆژێك یان كەمتر لە رۆژێك خەوتووین، هەندێكی تریان وتیان: مەگەر پەروەردگارتان خۆی بزانێت چەندە خەوتوون، دیارە هەستیان بەبرسێتی كردووە، بۆیە لاوێكیان پێشنیاری كردو وتی: دە یەكێكتان بنێرن بائەم پارە زیوەتان ببات بۆ شار، جا سەرنج بدات، بزانێت كێ خۆراكی خاوێن تری هەیە، با لەو خۆراكەتان بۆ بكرێت و بۆتان بهێنێت، با وریا و نەرم و نیان و لەسەرخۆش بێت، با كەسیش ئاگادار نەكات بە كارو بارتان.

(٢٠) چونكە بەڕاستی ئەو بت پەرستانە ئەگەر پێتان بزانن، ئەوە بەرد بارانتان دەكەن، یان دەتانگێڕنەوە بۆ ناو ئایینی خۆیان، ئەو كاتە ئیتر هەرگیز سەرفراز نابن.

وَكَذَٰلِكَ أَعْثَرْنَا عَلَيْهِمْ لِيَعْلَمُوٓا۟ أَنَّ وَعْدَ ٱللَّهِ حَقٌّ وَأَنَّ
ٱلسَّاعَةَ لَا رَيْبَ فِيهَآ إِذْ يَتَنَٰزَعُونَ بَيْنَهُمْ أَمْرَهُمْ ۖ فَقَالُوا۟
ٱبْنُوا۟ عَلَيْهِم بُنْيَٰنًا ۖ رَّبُّهُمْ أَعْلَمُ بِهِمْ ۚ قَالَ ٱلَّذِينَ غَلَبُوا۟ عَلَىٰٓ
أَمْرِهِمْ لَنَتَّخِذَنَّ عَلَيْهِم مَّسْجِدًا ﴿٢١﴾ سَيَقُولُونَ ثَلَٰثَةٌ
رَّابِعُهُمْ كَلْبُهُمْ وَيَقُولُونَ خَمْسَةٌ سَادِسُهُمْ كَلْبُهُمْ رَجْمًۢا
بِٱلْغَيْبِ ۖ وَيَقُولُونَ سَبْعَةٌ وَثَامِنُهُمْ كَلْبُهُمْ ۚ قُل رَّبِّىٓ أَعْلَمُ
بِعِدَّتِهِم مَّا يَعْلَمُهُمْ إِلَّا قَلِيلٌ ۗ فَلَا تُمَارِ فِيهِمْ إِلَّا مِرَآءً ظَٰهِرًا
وَلَا تَسْتَفْتِ فِيهِم مِّنْهُمْ أَحَدًا ﴿٢٢﴾ وَلَا تَقُولَنَّ لِشَا۟ىْءٍ
إِنِّى فَاعِلٌ ذَٰلِكَ غَدًا ﴿٢٣﴾ إِلَّآ أَن يَشَآءَ ٱللَّهُ ۚ وَٱذْكُر رَّبَّكَ
إِذَا نَسِيتَ وَقُلْ عَسَىٰٓ أَن يَهْدِيَنِ رَبِّى لِأَقْرَبَ مِنْ هَٰذَا رَشَدًا
﴿٢٤﴾ وَلَبِثُوا۟ فِى كَهْفِهِمْ ثَلَٰثَ مِا۟ئَةٍ سِنِينَ وَٱزْدَادُوا۟ تِسْعًا
﴿٢٥﴾ قُلِ ٱللَّهُ أَعْلَمُ بِمَا لَبِثُوا۟ ۖ لَهُۥ غَيْبُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۖ
أَبْصِرْ بِهِۦ وَأَسْمِعْ ۚ مَا لَهُم مِّن دُونِهِۦ مِن وَلِىٍّ وَلَا يُشْرِكُ
فِى حُكْمِهِۦٓ أَحَدًا ﴿٢٦﴾ وَٱتْلُ مَآ أُوحِىَ إِلَيْكَ مِن كِتَابِ
رَبِّكَ ۖ لَا مُبَدِّلَ لِكَلِمَٰتِهِۦ وَلَن تَجِدَ مِن دُونِهِۦ مُلْتَحَدًا ﴿٢٧﴾

(٢١) (وادیارە کە یەکێکیان ناردووە بۆ کڕینی خواردەمەنی و پارە زیوەکەی دەرهێناوە، کابرای دوکاندار خەڵکی لە دەور کۆ دەکاتەوە، چونکە مێژووی سکەی پارەکە زۆر کۆن بوو، ئەوسا بۆیان دەرکەوت، ئەم لاوە یەکێکە لەوانەی کە چەند سەدەیەک لەمەوبەر لە دەست پاشای بت پەرست و ستەمکار هەڵاتوون، خەڵکەکە لەگەڵ لاوەکەدا بەرەو ئەشکەوتەکە بۆ سەردانی ئەوانی تر چون)، ئا بەو شێوەیەش خەڵکیمان ڕێنموویی کرد تا بیانۆزنەوە و بزانن و دڵنیابن کە بەڕاستی بەڵێنی خوا لە زیندوو کردنەوەی مردووەکاندا حەق و ڕاستەو بێگومان قیامەتیش هەر دێت و هیچ گومانی تێدا نیە (لەوێ کە بەدیداریان شادبوون، لاوەکان خەوی یەکجاریان لێکەوت) لەکاتێکدا ئەو خەڵکە کێشەیان بوو لەسەر مەسەلەی زیندوو بوونەوە، ئینجا هەندێکیان وتیان: با چەند خانوویەکیان لەسەر دروست بکەن، پەروەردگاریان زانایە پێیان، بەڵام ئەوانەی کە دەسەڵاتیان هەبوو بەسەر کارو باریاندا، وتیان: بێگومان مزگەوتێکیان بەسەرەوە دروست دەکەین (کە ئەمەش شتێکی داهێنراو بوو لە ئایینی گاوریدا کە لەسەر گۆڕی پیاو چاکان پەرستگایان دروست دەکرد).

(٢٢) جا (دەربارەی ژمارەی یارانی ئەشکەوت) لە ئاییندەدا دەڵێن: سیانن و چوارهەمیان سەگەکەیانە، هەندێکی تر دەڵێن: پێنجن و شەش هەمیان سەگەکەیانە، کە هەموو ئەمانە قسەیەکی بێ بەڵگەن و چێو لەتاریکی کوتانە، هەندێکی‌تر دەڵێن حەوتن و هەشتەمیان سەگەکەیانە، ئەی محمد ﷺ پێیان بڵێ: هەر پەروەردگارم خۆی دەزانێت ژمارەیان چەندە، تەنها کەمێک نەبێت کەس ژمارەیان نازانێت، لەبەرئەوە موجادەلە مەکە لەبارەی ئەوانەوە جگە لە موجادەلەیەکی ئاشکراو ئاسان نەبێت، دەربارەشیان لەهیچ کەسێک لە خاوەنانی کتێب مەپرسە، (چونکە ئەوەی بەوەحی بەتۆ گەییوە بەسە لەو بارەیەوە).

(٢٣) هەرگیز دەربارەی هیچ شتێک و هیچ کارێک مەڵێ، من بەڕاستی سبەینێ ئەنجامدەری ئەو کارەم...

(٢٤) مەگەر بڵێیت: ئەگەر خوا بیەوێت و ویستی پەروەردگاری لەسەربێت، یادی پەروەردگاریشت بکە کاتێک کە لە بیرت چوو بڵێیت (إن شاء الله) لە ئەنجامدانی هەر کارێکدا بڵێ: ئومێدەوارم پەروەردگارم ڕێنموویم بکات بۆ بەڵگەیەکی نزیکتر لەمە تا بەو شێوەیەی کە پێی چاکە و لای پەسەندە جێبەجێی بکەم.

(٢٥) ئەوسا ئیتر یارانی ئەشکەوت سێ سەد ساڵی تەواوی (هەتاوی) لە ئەشکەوتەکەیاندا مانەوە (ئەگەر بە ساڵی مانگی حسابی بکەیت) نۆ دانە ساڵی تریشیان خستە سەر (واتە دەکاتە ٣٠٩ ساڵ خەویان لێکەوت).

(٢٦) پێیان بڵێ: خوا خۆی دەزانێت بەماوەی مانەوەیان لە ئەشکەوتەکەدا، هەر بۆ خوایە زانینی نهێنی ئاسمانەکان و زەوی، ئای کە چەندە بینەرو بیسەرە خوای گەورە! هیچ کەس نیە جگە لەو زاتە پشت و پەنای خەڵکی بێت، بێگومان ئەو خوایە لە کارو فەرمانڕەوایەتیەکەیدا هیچ کەس ناکات بەهاوتاو هاوبەشی خۆی.

(٢٧) (ئەی پێغەمبەرﷺ) ئەوەی بەوەحی ڕەوانە کراوە بۆ تۆ، لە قورئانی پەروەردگارت دەوری بکەرەوە، هیچ کەس نیە فەرمووده و گوفتاری ئەو زاتە بگۆڕێت، دڵنیاش بە کە هەرگیز پەناگاو یاریدەدەرێکی وەکو ئەو زاتەت دەست ناکەوێت.

وَٱصۡبِرۡ نَفۡسَكَ مَعَ ٱلَّذِينَ يَدۡعُونَ رَبَّهُم بِٱلۡغَدَوٰةِ وَٱلۡعَشِيِّ يُرِيدُونَ وَجۡهَهُۥۖ وَلَا تَعۡدُ عَيۡنَاكَ عَنۡهُمۡ تُرِيدُ زِينَةَ ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَاۖ وَلَا تُطِعۡ مَنۡ أَغۡفَلۡنَا قَلۡبَهُۥ عَن ذِكۡرِنَا وَٱتَّبَعَ هَوَىٰهُ وَكَانَ أَمۡرُهُۥ فُرُطٗا ﴿٢٨﴾ وَقُلِ ٱلۡحَقُّ مِن رَّبِّكُمۡۖ فَمَن شَآءَ فَلۡيُؤۡمِن وَمَن شَآءَ فَلۡيَكۡفُرۡۚ إِنَّآ أَعۡتَدۡنَا لِلظَّٰلِمِينَ نَارًا أَحَاطَ بِهِمۡ سُرَادِقُهَاۚ وَإِن يَسۡتَغِيثُواْ يُغَاثُواْ بِمَآءٖ كَٱلۡمُهۡلِ يَشۡوِي ٱلۡوُجُوهَۚ بِئۡسَ ٱلشَّرَابُ وَسَآءَتۡ مُرۡتَفَقًا ﴿٢٩﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ إِنَّا لَا نُضِيعُ أَجۡرَ مَنۡ أَحۡسَنَ عَمَلًا ﴿٣٠﴾ أُوْلَٰٓئِكَ لَهُمۡ جَنَّٰتُ عَدۡنٖ تَجۡرِي مِن تَحۡتِهِمُ ٱلۡأَنۡهَٰرُ يُحَلَّوۡنَ فِيهَا مِنۡ أَسَاوِرَ مِن ذَهَبٖ وَيَلۡبَسُونَ ثِيَابًا خُضۡرٗا مِّن سُندُسٖ وَإِسۡتَبۡرَقٖ مُّتَّكِـِٔينَ فِيهَا عَلَى ٱلۡأَرَآئِكِۚ نِعۡمَ ٱلثَّوَابُ وَحَسُنَتۡ مُرۡتَفَقٗا ﴿٣١﴾ ۞ وَٱضۡرِبۡ لَهُم مَّثَلٗا رَّجُلَيۡنِ جَعَلۡنَا لِأَحَدِهِمَا جَنَّتَيۡنِ مِنۡ أَعۡنَٰبٖ وَحَفَفۡنَٰهُمَا بِنَخۡلٖ وَجَعَلۡنَا بَيۡنَهُمَا زَرۡعٗا ﴿٣٢﴾ كِلۡتَا ٱلۡجَنَّتَيۡنِ ءَاتَتۡ أُكُلَهَا وَلَمۡ تَظۡلِم مِّنۡهُ شَيۡـٔٗاۚ وَفَجَّرۡنَا خِلَٰلَهُمَا نَهَرٗا ﴿٣٣﴾ وَكَانَ لَهُۥ ثَمَرٞ فَقَالَ لِصَٰحِبِهِۦ وَهُوَ يُحَاوِرُهُۥٓ أَنَا۠ أَكۡثَرُ مِنكَ مَالٗا وَأَعَزُّ نَفَرٗا ﴿٣٤﴾



(٢٨) ئارام بگرە و خۆت رابگرە لەگەڵ ئەو کەسانەدا کە خواپەرستی دەکەن و یادی پەروەردگاریان ویردی سەرزاریانە لە بەرەبەیان و دەمە و ئێواراندا، مەبەستیانە و دەیانەوێت کە ئەو زاتە لەخۆیان رازی بکەن، روو لەوان وەرمەگێرە و (روومەکە دنیاپەرستان و دەوڵەمەندان) لەکاتێکدا تۆ زینەت و رازاوەیی ژیانی دنیات بوێت و بەگوێی ئەوجۆرە کەسە مەکە کە دڵیمان غافڵ کردووە لە یادی خۆمان (بەهۆی دنیاپەرستیەوە) شوێنی ئارەزووی خۆی کەوتووە و هەرچی کاروباری هەیە بێ سەرو بنەو لە سنوور دەرچووە.

(٢٩) پێیان بڵێ: حەق هەر ئەوەیە کە لەلایەن پەروەردگارتانەوە بۆتان رەوانەکراوە، جا ئەوەی دەیەوێت با باوەڕ بهێنێت و ئەوەی دەیەوێت با کافرو بێ باوەڕ بێت، بێگومان ئێمە دۆزەخێکمان ئامادە کردووە بۆستەمکاران کەلە هەموولایەکەوە دەوریان دەدات و دیواری بڵێسەی ئابڵوقەی داون، خۆ ئەگەر هاوار بکەن لە ئازارو تینویەتیدا، ئەوە ئاو دەدرێن بە ئاوێکی گەرمی پیس و بۆن ناخۆش کە وەکو خڵتەی کانزایی تواوە وایە، ئەوەندەش گەرمە دەم و چاویان هەڵدەکوروزێنێت و دەیبرژێنێت، ئای کە چەند خواردنەوەیەکی تاڵ و ناخۆشە، چەندە جێگە و رێگەیەکی پڕ لە ئازارە.

(٣٠) لەولاشەوە، بۆ ئەوانەی کە بەراستی ئیمان و باوەڕیان هێناوە و کارو کردەوە چاکەکانیان ئەنجامداوە، با دڵنیابن ئێمە پاداشتی ئەو کەسە بەزایە نادەین کە کردارو رەفتاری جوان و پەسەندە...

(٣١) ئا ئەوانە باخەکانی بەهەشتی ـ عەدن ـ بۆیان ئامادەیە، کە چەندەها رووبار بەبەردەمیاندا جاری و رەوانە، بازن و دەستەبەند و (سەعاتی) ئاڵتونیان لە دەست دەکرێت، پۆشاکی سەوزی جوان دەپۆشن کە دووتوێیە، چینی ژێرەوە ئاوریشمی ئەستوورە، چینی سەرەوە ئاوریشمی تەنکە، (جا بەکەماڵی شادیەوە) لەسەر کورسلی و قەنەفە رازاوەکان شانیان داداوە، بەڕاستی ئەو بەختەوەرانە چاکترین و جوانترین و خۆشترین پاداشتیان دەستکەوتووە، هاورێ لەگەڵ خۆشترین و سازگارترین جێگە و رێگەدا.

(٣٢) (دەربارەی دۆزەخیان و بەهەشتیان) ئەی محمد ﷺ، نموونەیان بۆ بهێنەرەوە بەدوو پیاو کە یەکێکیانمان کردووە بەخاوەنی دوو باخی رەزو، دەوری هەردوو باخەکەمان بەدارخورما تەنیوە و لە نێوانیاندا باخ و بێستانمان فەراهەم هێناوە...

(٣٣) هەردوو باخەکەش میوەی چاکیان بەرهەم هێناوە و هیچیان لێ خەسار نەبووە و لە نێوان هەردوو باخەکەشدا رووبارێکمان هەڵقوڵاندووە...

(٣٤) جا ئەو خاوەن باخە، زۆر سەروەت و سامانی تری هەبوو، (کابرای خاوەن باخ غەرابوو بەسامانەکەی) بۆیە بە هاوەڵە هەژارە ئیماندارەکەی وت کاتێک گفتوگۆی لەگەڵدا دەکرد: من سامانی زۆر زیاترم هەیە لە تۆ، ماڵ و منداڵیشم بەهێز ترە لەوانەی تۆ.

وَدَخَلَ جَنَّتَهُۥ وَهُوَ ظَالِمٌ لِّنَفْسِهِۦ قَالَ مَآ أَظُنُّ أَن تَبِيدَ هَٰذِهِۦٓ أَبَدًا ﴿٣٥﴾ وَمَآ أَظُنُّ ٱلسَّاعَةَ قَآئِمَةً وَلَئِن رُّدِدتُّ إِلَىٰ رَبِّى لَأَجِدَنَّ خَيْرًا مِّنْهَا مُنقَلَبًا ﴿٣٦﴾ قَالَ لَهُۥ صَاحِبُهُۥ وَهُوَ يُحَاوِرُهُۥٓ أَكَفَرْتَ بِٱلَّذِى خَلَقَكَ مِن تُرَابٍ ثُمَّ مِن نُّطْفَةٍ ثُمَّ سَوَّىٰكَ رَجُلًا ﴿٣٧﴾ لَّٰكِنَّا۠ هُوَ ٱللَّهُ رَبِّى وَلَآ أُشْرِكُ بِرَبِّىٓ أَحَدًا ﴿٣٨﴾ وَلَوْلَآ إِذْ دَخَلْتَ جَنَّتَكَ قُلْتَ مَا شَآءَ ٱللَّهُ لَا قُوَّةَ إِلَّا بِٱللَّهِ ۚ إِن تَرَنِ أَنَا۠ أَقَلَّ مِنكَ مَالًا وَوَلَدًا ﴿٣٩﴾ فَعَسَىٰ رَبِّىٓ أَن يُؤْتِيَنِ خَيْرًا مِّن جَنَّتِكَ وَيُرْسِلَ عَلَيْهَا حُسْبَانًا مِّنَ ٱلسَّمَآءِ فَتُصْبِحَ صَعِيدًا زَلَقًا ﴿٤٠﴾ أَوْ يُصْبِحَ مَآؤُهَا غَوْرًا فَلَن تَسْتَطِيعَ لَهُۥ طَلَبًا ﴿٤١﴾ وَأُحِيطَ بِثَمَرِهِۦ فَأَصْبَحَ يُقَلِّبُ كَفَّيْهِ عَلَىٰ مَآ أَنفَقَ فِيهَا وَهِىَ خَاوِيَةٌ عَلَىٰ عُرُوشِهَا وَيَقُولُ يَٰلَيْتَنِى لَمْ أُشْرِكْ بِرَبِّىٓ أَحَدًا ﴿٤٢﴾ وَلَمْ تَكُن لَّهُۥ فِئَةٌ يَنصُرُونَهُۥ مِن دُونِ ٱللَّهِ وَمَا كَانَ مُنتَصِرًا ﴿٤٣﴾ هُنَالِكَ ٱلْوَلَٰيَةُ لِلَّهِ ٱلْحَقِّ ۚ هُوَ خَيْرٌ ثَوَابًا وَخَيْرٌ عُقْبًا ﴿٤٤﴾ وَٱضْرِبْ لَهُم مَّثَلَ ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا كَمَآءٍ أَنزَلْنَٰهُ مِنَ ٱلسَّمَآءِ فَٱخْتَلَطَ بِهِۦ نَبَاتُ ٱلْأَرْضِ فَأَصْبَحَ هَشِيمًا تَذْرُوهُ ٱلرِّيَٰحُ ۗ وَكَانَ ٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ مُّقْتَدِرًا ﴿٤٥﴾

(٣٥) رۆژێـک چـوو بـۆ سـەردانی یـەکێک لـە باخـەکانی (لەگـەڵ هاوەڵەکـەیدا) لـەکاتێکدا کـە ستەمکار بـوو لـە خـۆی (بـەهۆی لـە خۆبـایی بوونیەوە)، بۆیە لەبەرخۆیەوە وتی:گومان نابەم کە ئەم باخ و باخاتە هەرگیز لەناو بچێت ...

(٣٦) واشنازانم قیامەت بەرپا دەبێت، سوێند بە خوا ئەگـەر بمگێڕنەوە بـۆ لای پـەروەردگارم دوای مردنم، ئـەوە دڵنیـام کـەلای ئـەویش جێگـە و رێگـەو چـەندەها بـاخی رازاوەی لەمـە باشترم بۆ ئامادە کراوە.

(٣٧) هاوەڵـە ئیمانداره‌کـەی لـەکاتێکدا کـە گفتوگۆی لەگەڵدا دەکـرد پێـی وت: ئایـا بـاوەڕت نەماوە بەو زاتەی کە سەرەتا تۆی لە خاک دروست کـردووە؟! لـەوەودوا نوتفەیـەک بوویـت، پاشـان کردیتی بە پیاو؟!

(٣٨) بەڵام مـن دەڵێـم کـە: ـ ﷲ ـ(بەدیهێنـەری هەموو بوونەوەر)، هەر ئـەو پەروەردگارمـە، هیـچ جۆرە هـاوەڵ و شـەریکێک بـۆ ئـەو پـەروەردگارەم بڕیار نادەم.

(٣٩) دەبـوا کـاتێک چوویتـە نـاو باخەکەتـەوە، بتوتایە: ما شاء اللـە، هەرچی خوا ویستی لەسـەر بێت هەر ئەوە پێش دێت ئەم هەموو نازو نیعمەتە بەخششـی خوایـە و بەهەرکـەس بیـەوێت دەیبەخشێت، هیچ هێزو توانایەک بـۆ هیـچ کـەس نییە تەنها بەهۆی خواوە نەبێت ، ئەگـەر تـۆ مـن دەبینیت ماڵ و سامان و نەوەم لە تۆ کەمترە ...

(٤٠) ئەوە نزیکە و ئومێدەوارم پەروەردگارم لـەو باخەی تۆ چاکترم پێ ببەخشێت (لە دنیادا یان لە قیامەتدا) بەڵایەکیش لە ئاسمانـەوە بـۆ باخەکـەت بنـێرێت و، بیکاتـە زەویەکی رووت و خلیسک و وشک...

(٤١) یاخود (دوور نیە) ئاوی باخەکە رۆبچێت و هەرگیز نەتوانیت بەدەستی بهێنیت.

(٤٢) (سەرئەنجام پێشبینی هاوەڵی خواناسی هاتەدی) سەروەت و سامانی بـەبا دراو لـەناو بـرا، ئینجـا (بـەدەم ئـاخ و داخ و هەناسەی ساردەوە)، دەستی دەدا بەیەکداو لەسەرئەو مەسرەفەی کەتێدا کردبوو، لە کـاتێکدا باخەکـە بەسـەریەکدا تەپی بوو، لە جێی خۆیدا کاول بوو، ئەوسا دەیـوت: خۆزگـە مـن هیـچ جـۆرە هـاوەڵێکم بـۆ خـوا بڕیـار نەدایـە (بـاوەڕی دامەرزاوم تەنها بەو هەبوایە).

(٤٣) ئیترهیچ دەستەو تاقمێک نەبوو جگەلە خوا فریای بکەوێت و لەخەشمی خوا دەربازی بکات، سەرکەوتووش نەبوو.

(٤٤) ئا لەو کاتانەداو لەو جۆرە حاڵانەدا یارمـەتی و کۆمـەک تەنـها لـە خـوا، پـەروەردگاری حـەق و راسـت و دروست وەردەگیرێت، هەر خۆی چاکترین پاداشتی ئامادە کردووە، چاکترین سەرئەنجامیش چاوەڕێی بەختەوەرانە.

(٤٥) (ئـەی پێغەمبـەرﷺ) نموونـەیان بـۆ بهێنـەرەوە کـە ژیـانی دنیـا وەک ئـەو ئـاوی بارانـە وایـە کەلـە ئاسمانـەوە دەیبارێنین و رووەکی زەوی بەهۆیەوە بەیەکدا دێن، لە دوای ماوەیـەکی کـەم (هـەموو ئـەو رووەک و گژوگیایـە) دەبێتـە پووش و پەڵاشێکی ورد و خاش، رەشەبا بەم لاو لادا بڵاوی دەکاتـەوە، خـوای گـەورەش هەمیشـە و بـەردەوام دەسـەڵاتی بەسەر هەموو شتێکدا هەیە.

ٱلۡمَالُ وَٱلۡبَنُونَ زِينَةُ ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَاۖ وَٱلۡبَٰقِيَٰتُ ٱلصَّٰلِحَٰتُ
خَيۡرٌ عِندَ رَبِّكَ ثَوَابٗا وَخَيۡرٌ أَمَلٗا ﴿٤٦﴾ وَيَوۡمَ نُسَيِّرُ ٱلۡجِبَالَ وَتَرَى
ٱلۡأَرۡضَ بَارِزَةٗ وَحَشَرۡنَٰهُمۡ فَلَمۡ نُغَادِرۡ مِنۡهُمۡ أَحَدٗا ﴿٤٧﴾ وَعُرِضُواْ
عَلَىٰ رَبِّكَ صَفّٗا لَّقَدۡ جِئۡتُمُونَا كَمَا خَلَقۡنَٰكُمۡ أَوَّلَ مَرَّةِۭۚ بَلۡ زَعَمۡتُمۡ
أَلَّن نَّجۡعَلَ لَكُم مَّوۡعِدٗا ﴿٤٨﴾ وَوُضِعَ ٱلۡكِتَٰبُ فَتَرَى ٱلۡمُجۡرِمِينَ
مُشۡفِقِينَ مِمَّا فِيهِ وَيَقُولُونَ يَٰوَيۡلَتَنَا مَالِ هَٰذَا ٱلۡكِتَٰبِ
لَا يُغَادِرُ صَغِيرَةٗ وَلَا كَبِيرَةً إِلَّآ أَحۡصَىٰهَاۚ وَوَجَدُواْ مَا عَمِلُواْ
حَاضِرٗاۗ وَلَا يَظۡلِمُ رَبُّكَ أَحَدٗا ﴿٤٩﴾ وَإِذۡ قُلۡنَا لِلۡمَلَٰٓئِكَةِ ٱسۡجُدُواْ
لِأٓدَمَ فَسَجَدُوٓاْ إِلَّآ إِبۡلِيسَ كَانَ مِنَ ٱلۡجِنِّ فَفَسَقَ عَنۡ أَمۡرِ رَبِّهِۦٓۗ
أَفَتَتَّخِذُونَهُۥ وَذُرِّيَّتَهُۥٓ أَوۡلِيَآءَ مِن دُونِي وَهُمۡ لَكُمۡ عَدُوُّۢۚ
بِئۡسَ لِلظَّٰلِمِينَ بَدَلٗا ﴿٥٠﴾ ۞ مَّآ أَشۡهَدتُّهُمۡ خَلۡقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ
وَٱلۡأَرۡضِ وَلَا خَلۡقَ أَنفُسِهِمۡ وَمَا كُنتُ مُتَّخِذَ ٱلۡمُضِلِّينَ عَضُدٗا
﴿٥١﴾ وَيَوۡمَ يَقُولُ نَادُواْ شُرَكَآءِيَ ٱلَّذِينَ زَعَمۡتُمۡ فَدَعَوۡهُمۡ
فَلَمۡ يَسۡتَجِيبُواْ لَهُمۡ وَجَعَلۡنَا بَيۡنَهُم مَّوۡبِقٗا ﴿٥٢﴾ وَرَءَا ٱلۡمُجۡرِمُونَ
ٱلنَّارَ فَظَنُّوٓاْ أَنَّهُم مُّوَاقِعُوهَا وَلَمۡ يَجِدُواْ عَنۡهَا مَصۡرِفٗا ﴿٥٣﴾



(٤٦) ماڵ و سامان و وەچە، زینەت و جوانین بۆ ژیانی دنیا، بەڵام دڵنیابن کردەوە چاکەکان کە بەرهەمیان دەمێنێتەوە پاداشتیان چاکترە لای پەروەردگارت و ئومێد و هیوای چاکتریشی لێ دەکرێت بۆ خاوەنەکانیان.

(٤٧) رۆژێک دێت کەکێوەکان لە جێگەی خۆیان هەڵدەکەنین و گۆشەو کەناری زەوی بەزەقی دەبینیت، لەکاتێکدا هەموو خەڵکیشمان کۆ کردۆتەوە و کەسیشمان لێ بەجێ نەهێشتوون.

(٤٨) ئەو رۆژە سەرجەم نەوەی ئادەم، ریز کراون لەبەردەم پەروەردگاردا، خوای گەورە روو بەکافران دەفەرموێت: سوێند بێت واهاتنەوە بۆلامان هەر وەک لە سەرەتادا دروستمان کردوون (بەرووتی بێ ماڵ وسامان و...هتد) لەحاڵێکدا کە ئێوە گومانتتان وابوو، واشتان دەوت کە هەرگیز کاتێکمان دیاری نەکردووە بۆ لێپرسینەوەتان.

(٤٩) نامەی کردەوەی هەرکەس دادەنرێت، (ئیمانداران دڵخۆشن) بەڵام تاوانباران دەبینیت دڵەلەرزێ و دڵەڕاوکێیانە لە کاروکردەوەی ناپەسەندی تۆمارکراویان، بۆیە دەڵێن: هاوار لە ئێمە ئەم نامە و دۆسیەیە چیە؟! هیچ گوناهێکی وردو درشت بەجێ ناهێڵێت بەڵکو هەمووی تۆمار کردوە، ئەو خەڵکە هەرچیان کردووە (بەدەنگ و رەنگەوە) ئامادەیە، بێگومان پەروەردگاری تۆ ستەم لە هیچ کەس ناکات.

(٥٠) ئێمە کاتێک بەفریشتەکانمان وت سوژدەبەرن بۆ ئادەم، هەر هەموو سوژدەیان برد جگە لە ئیبلیس کە لەدەستەی پەریەکان بوو بەهۆی ئەوەوە لە فەرمانی پەروەردگاری یاخی بوو، ئایا رەوایە کە ئەو و نەوەکەی بکەنە پاڵپشت و یارو یاوەری خۆتان لە جیاتی من، لەحاڵێکدا ئەوان دوژمنی هەمیشەیی ئێوەن، ئای کە چەندە کارێکی خراپ و نارەوایە بۆ ستەمکاران کە لە جیاتی خوا دوژمنێکی وەک شەیتانیان داناوە و گوێڕایەڵی دەکەن.

(٥١) وەنەبێت من لەکاتی دروستکردنی ئاسمانەکان و زەویدا ئەوانم ئامادە کردبێت، بگرە هەتا لە دروست بوونی خۆشیان ئاگادارنین، بەڕاستی من هەرگیز ئەوانەی خەڵک گومڕا دەکەن نەمکردووە بەیارمەتیدەری خۆم و پشتم پێ نەبەستوون.

(٥٢) رۆژێک دێت کە خوا لە هاوەڵگەران دەپرسێت و پێیان دەڵێت: کوا ئەو شەریک و هاوەڵانەی کە بۆ منتان بڕیار دەدا، جا بانگیان لێ دەکەن و هاواریان لێدەکەن، (بەڵام بێ سوودە) هەر وەڵامیشیان نادەنەوە، ئیتر بۆ هەمیشە سزای سەخت دەخەینە نێوانیانەوە.

(٥٣) (ئا لەو گیرخواردنەدا) تاوانباران دۆزەخ دەبینن و دڵنیان بێگومان دەچنە ناوی و تێکەڵی دەبن، هیچ پەناگاو کەلێنێکیش نیە کە لێی دەربازبن.

وَلَقَدْ صَرَّفْنَا فِي هَٰذَا الْقُرْءَانِ لِلنَّاسِ مِن كُلِّ مَثَلٍ وَكَانَ الْإِنسَٰنُ أَكْثَرَ شَيْءٍ جَدَلًا ﴿٥٤﴾ وَمَا مَنَعَ النَّاسَ أَن يُؤْمِنُوٓا إِذْ جَآءَهُمُ الْهُدَىٰ وَيَسْتَغْفِرُوا رَبَّهُمْ إِلَّآ أَن تَأْتِيَهُمْ سُنَّةُ الْأَوَّلِينَ أَوْ يَأْتِيَهُمُ الْعَذَابُ قُبُلًا ﴿٥٥﴾ وَمَا نُرْسِلُ الْمُرْسَلِينَ إِلَّا مُبَشِّرِينَ وَمُنذِرِينَ وَيُجَٰدِلُ الَّذِينَ كَفَرُوا بِالْبَٰطِلِ لِيُدْحِضُوا بِهِ الْحَقَّ وَاتَّخَذُوٓا ءَايَٰتِي وَمَآ أُنذِرُوا هُزُوًا ﴿٥٦﴾ وَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّن ذُكِّرَ بِـَٔايَٰتِ رَبِّهِۦ فَأَعْرَضَ عَنْهَا وَنَسِيَ مَا قَدَّمَتْ يَدَاهُ إِنَّا جَعَلْنَا عَلَىٰ قُلُوبِهِمْ أَكِنَّةً أَن يَفْقَهُوهُ وَفِيٓ ءَاذَانِهِمْ وَقْرًا وَإِن تَدْعُهُمْ إِلَى الْهُدَىٰ فَلَن يَهْتَدُوٓا إِذًا أَبَدًا ﴿٥٧﴾ وَرَبُّكَ الْغَفُورُ ذُو الرَّحْمَةِ لَوْ يُؤَاخِذُهُم بِمَا كَسَبُوا لَعَجَّلَ لَهُمُ الْعَذَابَ بَل لَّهُم مَّوْعِدٌ لَّن يَجِدُوا مِن دُونِهِۦ مَوْئِلًا ﴿٥٨﴾ وَتِلْكَ الْقُرَىٰٓ أَهْلَكْنَٰهُمْ لَمَّا ظَلَمُوا وَجَعَلْنَا لِمَهْلِكِهِم مَّوْعِدًا ﴿٥٩﴾ وَإِذْ قَالَ مُوسَىٰ لِفَتَىٰهُ لَآ أَبْرَحُ حَتَّىٰٓ أَبْلُغَ مَجْمَعَ الْبَحْرَيْنِ أَوْ أَمْضِيَ حُقُبًا ﴿٦٠﴾ فَلَمَّا بَلَغَا مَجْمَعَ بَيْنِهِمَا نَسِيَا حُوتَهُمَا فَاتَّخَذَ سَبِيلَهُۥ فِي الْبَحْرِ سَرَبًا ﴿٦١﴾

(٥٤) سوێند بە خوا بێگومان ئێمە لەم قورئانەدا لە هەموو جۆرە نموونەیەکمان هێناوەتەوە بۆ خەڵکی (تا پەندو ئامۆژگاری لێ وەربگرن) لە کاتێکدا ئینسان لە هەموو شتێک زیاتر موجادەلە دەکات و لە شت دەکۆڵێتەوە.

(٥٥) خەڵکی خوانەناس هیچ شتێک نەبووەتە کۆسپ لە رێیاندا تا باوەڕ بهێنن کاتێک کە هیدایەتیان بۆ رەوانە کراوە و داوای لێخۆشبوون بکەن لە پەروەردگاریان، مەگەر تەنها ئەوە نەبێت کە یاسای پێشینان بەسەریاندا بسەپێت (بەلەناو بردنیان) یاخود سزا روو بەڕوویان بێتەوە (لە قیامەتدا).

(٥٦) ئێمە پێغەمبەران تەنها بەمژدەدەرو ترسێنەر نەبێت نانێرین کەچی ئەوانەی کافرو بێ باوەڕ بوون هەر موجادەلە و دەمبازی دەکەن بە بەڵگەی پڕوپووچ، بۆ ئەوەی حەق و راستی بەتاڵ بکەنەوە و بیترازێنن، هەروەها ئایەت و فەرمانەکانی من و ئەوەی ئەوانی پێ هۆشیار کراوەتەوە کردویانە بەگاڵتە.

(٥٧) کێ لەوە ستەمکارترە کە یادەوەری کرابێت بە ئایەت و فەرمانەکانی پەروەردگاری، کەچی رووی لێ وەرگێڕاون و لووتی بەرز گرتووە و ئەوەشی لە یاد کردووە کە چ دەستپێشکەریەکی کردووە لە گوناهو تاوان، ئێمە بەڕاستی پەردەمان هێناوە بەسەر دڵیاندا تا لە ئایەتەکانی ئێمە تێنەگەن و قورسی و کەڕیشمان کردۆتە گوێیانەوە، خۆ ئەگەر بانگیان بکەیت بۆ رێبازی هیدایەت و دینداری، ئەوە هەرگیز ئەوانە ئەو هیدایەتە وەرناگرن.

(٥٨) پەروەردگاری تۆ لێخۆشبووە و خاوەنی رەحمەت و میهرەبانیە، ئەگەر بەکردەوەی ئەو خەڵکە بکات هەموویان بە خێرایی دەپێچێتەوە و بەسزای سەخت دایاندەگرێت، بەڵکو کاتی دیاریکراویان بۆ هەیە (هەرکاتێک یەخەی پێگرتن) هەرگیز پەنایەکیان دەست ناکەوێت بێجگە لە پەنای خوا.

(٥٩) ئەوەتە ئەو شارو شارۆچکانە (کە باسیانتان بیستووە، یاخود بەچاوی خۆتان دەیبینن) لەناومان بردوون وکاولمان کردوون کاتێک کە (دانیشتوانی) ستەمیان کردووە و بۆ لەناوبردنیان کاتی دیاریکراومان بڕیارداوە.

(٦٠) (یادیان بێنە) کاتێک موسا بەهاوەڵی لاوی خۆی وت: من کۆڵ نادەم و دەڕۆم، ئەگەر چەندەها رۆژم پێ بچێت تا دەگەمە ئەو شوێنەی کە دوودەریاکە یەکدەگرن یان دەگەمە ئەنجام، یاخود ماوەیەکی زۆر دەڕۆم و دەگەڕێم (خوای گەورە ویستوویەتی موسا پێغەمبەر عليه السلام تێبگەیەنێت کە بەندەی هەیە لە بواری تردا شارەزان، لەبەرئەوە رێنموویی کردووە تا بگەڕێت بەشوێن ئەو جۆرە کەسانەدا و لەوانیش سوود وەربگرێت).

(٦١) کاتێک گەیشتنە ئەو شوێنەی کە دوو دەریاکە بەیەک دەگەن، ماسیەکەیان کە لەگەڵ خۆیاندا هەڵیان گرتبوو بۆ توێشووی سەفەر، فەرامۆشیان کردبوو، ئەویش هەڵبەزی بۆوە و رێگەی ناو دەریای بۆ خۆی گرتەبەر.

فَلَمَّا جَاوَزَا قَالَ لِفَتَىٰهُ ءَاتِنَا غَدَآءَنَا لَقَدْ لَقِينَا مِن سَفَرِنَا
هَٰذَا نَصَبًا ﴿٦٢﴾ قَالَ أَرَءَيْتَ إِذْ أَوَيْنَآ إِلَى ٱلصَّخْرَةِ فَإِنِّى نَسِيتُ
ٱلْحُوتَ وَمَآ أَنسَىٰنِيهُ إِلَّا ٱلشَّيْطَٰنُ أَنْ أَذْكُرَهُۥ وَٱتَّخَذَ سَبِيلَهُۥ
فِى ٱلْبَحْرِ عَجَبًا ﴿٦٣﴾ قَالَ ذَٰلِكَ مَا كُنَّا نَبْغِ فَٱرْتَدَّا عَلَىٰٓ ءَاثَارِهِمَا
قَصَصًا ﴿٦٤﴾ فَوَجَدَا عَبْدًا مِّنْ عِبَادِنَآ ءَاتَيْنَٰهُ رَحْمَةً مِّنْ
عِندِنَا وَعَلَّمْنَٰهُ مِن لَّدُنَّا عِلْمًا ﴿٦٥﴾ قَالَ لَهُۥ مُوسَىٰ هَلْ أَتَّبِعُكَ
عَلَىٰٓ أَن تُعَلِّمَنِ مِمَّا عُلِّمْتَ رُشْدًا ﴿٦٦﴾ قَالَ إِنَّكَ لَن تَسْتَطِيعَ
مَعِىَ صَبْرًا ﴿٦٧﴾ وَكَيْفَ تَصْبِرُ عَلَىٰ مَا لَمْ تُحِطْ بِهِۦ خُبْرًا ﴿٦٨﴾ قَالَ
سَتَجِدُنِىٓ إِن شَآءَ ٱللَّهُ صَابِرًا وَلَآ أَعْصِى لَكَ أَمْرًا ﴿٦٩﴾ قَالَ
فَإِنِ ٱتَّبَعْتَنِى فَلَا تَسْـَٔلْنِى عَن شَىْءٍ حَتَّىٰٓ أُحْدِثَ لَكَ مِنْهُ ذِكْرًا
﴿٧٠﴾ فَٱنطَلَقَا حَتَّىٰٓ إِذَا رَكِبَا فِى ٱلسَّفِينَةِ خَرَقَهَا قَالَ أَخَرَقْتَهَا
لِتُغْرِقَ أَهْلَهَا لَقَدْ جِئْتَ شَيْـًٔا إِمْرًا ﴿٧١﴾ قَالَ أَلَمْ أَقُلْ إِنَّكَ
لَن تَسْتَطِيعَ مَعِىَ صَبْرًا ﴿٧٢﴾ قَالَ لَا تُؤَاخِذْنِى بِمَا نَسِيتُ وَلَا
تُرْهِقْنِى مِنْ أَمْرِى عُسْرًا ﴿٧٣﴾ فَٱنطَلَقَا حَتَّىٰٓ إِذَا لَقِيَا غُلَٰمًا فَقَتَلَهُۥ
قَالَ أَقَتَلْتَ نَفْسًا زَكِيَّةًۢ بِغَيْرِ نَفْسٍ لَّقَدْ جِئْتَ شَيْـًٔا نُّكْرًا ﴿٧٤﴾

(٦٢) جا کاتێک تێپەڕین (لەو شوێنە و، لە جێیەکی تر لایاندا) موسا بەهاوەڵەکەی وت: نادەی خواردنەکەمان بهێنە، چونکە بەڕاستی لەم سەفەرەماندا زۆر هیلاک و ماندوو بووین.

(٦٣) لاوەکە وتی: ئەگەر لە بیرت بێت ئەو کاتەی کە چووینە سەر بەردە گەورەکە (بۆ حەوانەوە) من بیرم چوو باسی ماسیەکەت بۆ بکەم، کەسیش لە بیری نەبردمەوە شەیتان نەبێت، کە بۆتی باس بکەم، لەڕاستیدا ئەو ماسیە (زیندوو بۆوە و) بە شێوەیەکی زۆر سەیر خۆی کرد بەناو دەریادا.

(٦٤) موسا عليه السلام وتی: هەر ئەوەبوو کە ئێمە دەمانویست (واتە: دەبوو تا لەو شوێنەدا چاوەڕێ بوینایە) ئیتر بە ناچاری گەڕانەوە بۆ ئەو شوێنەی کە بە جێیان هێشتبوو.

(٦٥) لەوێ بە بەندەیەک لە بەندەکانی ئێمە ئاشنا بوو کە لە ڕەحمەتی تایبەتی خۆمان بەهرەوەرمان کردبووو زانست و زانیاری تایبەتی خۆمانمان پێ بەخشیبوو، موسا عليه السلام پێی وت: ئایا مۆڵەتم دەدەیت کە شوێنت بکەوم تا لەو زانست و زانیاریەی پێت بەخشراوە منیش بەهرەدار بکەیت؟

(٦٧) زاناکە وتی: بەڕاستی تۆ هەرگیز ناتوانیت لەگەڵ مندا خۆڕاگر بیت (بێدەنگ بیت بەرامبەر ڕەفتار و کردارم، چونکە من شتی سەرسوڕهێنەر دەکەم و تۆ لە نهێنیەکەی تێناگەیت).

(٦٨) جا چۆن خۆدەگریت لە بەرامبەر شتێکەوە کە هەواڵت لێی نیە وئەم سەرو ئەو سەری نازانیت.

(٦٩) موسا وتی: دەمبینیت ئەگەر خوا ویستی لەسەر بێت خۆڕاگر دەبم و لە هیچ فەرمانێکت دەرناچم.

(٧٠) زاناکە وتی: جا ئەگەر شوێنم کەوتیت ئەوە پرسیارم لەهیچ شتێک لێ مەکە، هەتا خۆم لەنهێنیەکەی ئاگادارت نەکەم.

(٧١) هەتا کاتێک پێکەوە دەرچوون و سواری کەشتیەکە بوون، زاناکە دەستی کرد بە کون کردن و عەیبدار کردنی، موسا (خۆی پێنەگیراو) وتی: باشە، ئاخر، ئەوە تۆ ئەم کەشتیە کون دەکەیت، دەتەوێت هەرچی سەرنشینەکانی هەیە نوقمی بکەیت، سوێند بەخوا بەڕاستی کارێکی ناشایستەی گەورەت کرد!!

(٧٢) زاناکە وتی: ئەم وت: تۆ هەرگیز ناتوانیت لەگەڵ مندا خۆڕاگر بیت!!.

(٧٣) موسا وتی: لێم مەگرە چونکە مەرجەکەم فەرامۆش کردو فێربوونی ئەم زانیاریەی کە دەمەوێت لە تۆوە فێربم لەسەرم قورس و گران مەکە.

(٧٤) (دوایی دابەزینە سەر وشکانی) کەوتنە ڕێ، هەتا گەیشتنە منداڵێک، زاناکە گرتی و کوشتی، موسا وتی: سەیرە، ئەوە بۆچی کەسێکی بێ گوناهت کوشت بێ ئەوەی ئەو تاوانێکی وای کردبێت و (شایستەی کوشتن بێت) سوێند بەخوا بەڕاستی کارێکی ناپەسەند و ناڕەوات ئەنجامدا!!



﴿ قَالَ أَلَمْ أَقُل لَّكَ إِنَّكَ لَن تَسْتَطِيعَ مَعِيَ صَبْرًا ﴿٧٥﴾ قَالَ إِن سَأَلْتُكَ عَن شَيْءٍ بَعْدَهَا فَلَا تُصَاحِبْنِي قَدْ بَلَغْتَ مِن لَّدُنِّي عُذْرًا ﴿٧٦﴾ فَانطَلَقَا حَتَّىٰ إِذَا أَتَيَا أَهْلَ قَرْيَةٍ اسْتَطْعَمَا أَهْلَهَا فَأَبَوْا أَن يُضَيِّفُوهُمَا فَوَجَدَا فِيهَا جِدَارًا يُرِيدُ أَن يَنقَضَّ فَأَقَامَهُ قَالَ لَوْ شِئْتَ لَاتَّخَذْتَ عَلَيْهِ أَجْرًا ﴿٧٧﴾ قَالَ هَٰذَا فِرَاقُ بَيْنِي وَبَيْنِكَ سَأُنَبِّئُكَ بِتَأْوِيلِ مَا لَمْ تَسْتَطِع عَّلَيْهِ صَبْرًا ﴿٧٨﴾ أَمَّا السَّفِينَةُ فَكَانَتْ لِمَسَاكِينَ يَعْمَلُونَ فِي الْبَحْرِ فَأَرَدتُّ أَنْ أَعِيبَهَا وَكَانَ وَرَاءَهُم مَّلِكٌ يَأْخُذُ كُلَّ سَفِينَةٍ غَصْبًا ﴿٧٩﴾ وَأَمَّا الْغُلَامُ فَكَانَ أَبَوَاهُ مُؤْمِنَيْنِ فَخَشِينَا أَن يُرْهِقَهُمَا طُغْيَانًا وَكُفْرًا ﴿٨٠﴾ فَأَرَدْنَا أَن يُبْدِلَهُمَا رَبُّهُمَا خَيْرًا مِّنْهُ زَكَاةً وَأَقْرَبَ رُحْمًا ﴿٨١﴾ وَأَمَّا الْجِدَارُ فَكَانَ لِغُلَامَيْنِ يَتِيمَيْنِ فِي الْمَدِينَةِ وَكَانَ تَحْتَهُ كَنزٌ لَّهُمَا وَكَانَ أَبُوهُمَا صَالِحًا فَأَرَادَ رَبُّكَ أَن يَبْلُغَا أَشُدَّهُمَا وَيَسْتَخْرِجَا كَنزَهُمَا رَحْمَةً مِّن رَّبِّكَ وَمَا فَعَلْتُهُ عَنْ أَمْرِي ذَٰلِكَ تَأْوِيلُ مَا لَمْ تَسْطِع عَّلَيْهِ صَبْرًا ﴿٨٢﴾ وَيَسْأَلُونَكَ عَن ذِي الْقَرْنَيْنِ قُلْ سَأَتْلُو عَلَيْكُم مِّنْهُ ذِكْرًا ﴿٨٣﴾

(٧٥) زاناکه وتی: پێم نه‌وتیت که به‌راستی تۆ هه‌رگیز ناتوانیت له‌گه‌ڵ منـدا ئـارام بگریت و دان به‌خۆتدا بگریت.

(٧٦) موسا وتی: ئه‌گه‌ر دوای ئه‌مه پرسیاری هه‌ر شتێکی تـرم لێ کردیت، ئـه‌وه هاورێیـه‌تیم مه‌که، به‌ڕاستی به‌ڕای من مافی خۆتـه و له‌لایـه‌ن منه‌وه لێ بووردراویت (چونکه مـن به‌ناسـانی لـه هه‌ڵسوکه‌وتی تۆ تێناگه‌م).

(٧٧) پاشان ده‌رچوون و ڕۆیشتـن هـه‌تا گه‌یشتنه نـاو خـه‌ڵکی شـارۆچکه‌یه‌ک (برسیان بـوو) داوای خۆراکیان له خه‌ڵکه‌که کرد، که‌چی ده‌ستیان نا بـه ڕوویانه‌وه و میوانداریان لێ نه‌کردن، ئه‌وسا لـه‌ناو شـاره‌که‌دا دیوارێکیـان بـه‌دی کـرد خـه‌ریکبوو ده‌ڕوخا، به‌ڵام زاناکه هه‌ڵیچنیه‌وه و چاکی کرده‌وه و بـه‌رزی کـرده‌وه، موسا وتـی: ئه‌گـه‌ر بتویستـایه، ئـه‌وه کرێیـه‌کت به‌رامبـه‌ر ئـه‌م کـاره وه‌رده‌گـرت (ده‌ماندا به‌خۆراک و پێی تێر ده‌بووین).

(٧٨) زاناکه وتی: ئیتر ئـاڵیره بـه دواوه کـاتی جیابوونه‌وه‌ی نێوانی من و تـۆیه، من تاوێکی تـر تۆ ئـاگـادار ده‌که‌م لـه حه‌قیقـه‌ت و سه‌ره‌نجـامی ئـه‌و شتانـه‌ی کـه نه‌تتوانـی ئـارام بگـریت لـه به‌رامبه‌ریانه‌وه.

(٧٩) ئـه‌و که‌شتیـه‌ی (عـه‌یبدارم کـرد چـه‌ند هه‌ژارێک خاوه‌نی بوون له ده‌ریادا کاریان ده‌کـرد، جا منیش ویستم عه‌یبداری بکه‌م، له‌کاتێکدا له‌و ناوه‌دا پاشایه‌ک هه‌بوو که هه‌موو که‌شتیه‌کی (چاک و ڕێکو پێکـی) داگیر ده‌کرد.

(٨٠) منداڵه‌که‌ش (کـه کوشتـم) دایـک و بـاوکێکی ئیمـانداری هـه‌بوو، ترسـاین لـه‌وه‌ی کـه به‌سه‌رکه‌شی و بێدینـی و خوانه‌ناسی هیلاک و ماندویان بکات (چونکه هه‌ر له ئێستاوه سه‌رکه‌شی و لاساریی پێوه دیار بوو).

(٨١) (به‌و کاره‌مان) ویستمان که په‌روه‌ردگاریان (له‌جیاتی ئه‌و) پاکترو چاکتریان پێ ببه‌خشێت و بـه‌منداڵێکی خـاوه‌ن به‌زه‌یی و میهره‌بانتر به‌هره‌وه‌ریان بکات (منداڵه‌که‌ش به‌هه‌شتی بێت).

(٨٢) دیواره‌که‌ش که چاکم کرده‌وه، خاوه‌نه‌که‌ی دوو منداڵی هه‌تیوی شارۆچکه‌که بوون، له ژێریدا گه‌نجینه‌یـه‌کی (زێـڕو زیویان) هه‌بوو (که باوکیان بۆی شاردبوونه‌وه، ئه‌گـه‌ر گوێمـان پـێ نه‌دایـه، بـاران و لافـاو ده‌ری ده‌خست و ئـه‌و خه‌ڵکـه ڕه‌زیلـه‌ی کـه میوانداریـان لێ نـه‌کردین، ده‌ستیان ده‌کـه‌وت)، بـاوکی ئـه‌و دوو منداڵـه‌ش خوانـاس و چـاک بـوو، جـا په‌روه‌ردگارت ویستی کاتێک گه‌نجینه‌که‌یان ده‌ست بکه‌وێت که گه‌وره و بـه‌هێزبن، ئه‌وسا ده‌ری بـهێنن، ئه‌مـه‌ش وه‌کـو ڕه‌حمه‌تێکی تایبه‌تی له‌لایـه‌ن په‌روه‌ردگارتـه‌وه (له‌بـه‌ر خـاتری باوکیـان)، دڵنیاشبـه کـه هـه‌موو ئـه‌و کارانـه‌م لـه خـۆوه نه‌کردووه، ئیتر ئه‌وه بوو ڕاز و نهێنی ئه‌و شتانه‌ی که خۆت بۆ نه‌ده‌گیرا کاتێک ئه‌نجامم ده‌دان.

(٨٣) ده‌رباره‌ی (ذو القرنین) یش پرسیارت لێ ده‌که‌ن، پێیان بڵێ: گۆشه‌یه‌ک له به‌سه‌رهاتی ئه‌وتان بۆ باس ده‌که‌م.

إِنَّا مَكَّنَّا لَهُۥ فِي ٱلْأَرْضِ وَءَاتَيْنَٰهُ مِن كُلِّ شَيْءٖ سَبَبٗا ﴿٨٤﴾ فَأَتْبَعَ سَبَبًا ﴿٨٥﴾ حَتَّىٰٓ إِذَا بَلَغَ مَغْرِبَ ٱلشَّمْسِ وَجَدَهَا تَغْرُبُ فِي عَيْنٍ حَمِئَةٖ وَوَجَدَ عِندَهَا قَوْمٗاۗ قُلْنَا يَٰذَا ٱلْقَرْنَيْنِ إِمَّآ أَن تُعَذِّبَ وَإِمَّآ أَن تَتَّخِذَ فِيهِمْ حُسْنٗا ﴿٨٦﴾ قَالَ أَمَّا مَن ظَلَمَ فَسَوْفَ نُعَذِّبُهُۥ ثُمَّ يُرَدُّ إِلَىٰ رَبِّهِۦ فَيُعَذِّبُهُۥ عَذَابٗا نُّكْرٗا ﴿٨٧﴾ وَأَمَّا مَنْ ءَامَنَ وَعَمِلَ صَٰلِحٗا فَلَهُۥ جَزَآءً ٱلْحُسْنَىٰۖ وَسَنَقُولُ لَهُۥ مِنْ أَمْرِنَا يُسْرٗا ﴿٨٨﴾ ثُمَّ أَتْبَعَ سَبَبًا ﴿٨٩﴾ حَتَّىٰٓ إِذَا بَلَغَ مَطْلِعَ ٱلشَّمْسِ وَجَدَهَا تَطْلُعُ عَلَىٰ قَوْمٖ لَّمْ نَجْعَل لَّهُم مِّن دُونِهَا سِتْرٗا ﴿٩٠﴾ كَذَٰلِكَۖ وَقَدْ أَحَطْنَا بِمَا لَدَيْهِ خُبْرٗا ﴿٩١﴾ ثُمَّ أَتْبَعَ سَبَبًا ﴿٩٢﴾ حَتَّىٰٓ إِذَا بَلَغَ بَيْنَ ٱلسَّدَّيْنِ وَجَدَ مِن دُونِهِمَا قَوْمٗا لَّا يَكَادُونَ يَفْقَهُونَ قَوْلٗا ﴿٩٣﴾ قَالُواْ يَٰذَا ٱلْقَرْنَيْنِ إِنَّ يَأْجُوجَ وَمَأْجُوجَ مُفْسِدُونَ فِي ٱلْأَرْضِ فَهَلْ نَجْعَلُ لَكَ خَرْجًا عَلَىٰٓ أَن تَجْعَلَ بَيْنَنَا وَبَيْنَهُمْ سَدّٗا ﴿٩٤﴾ قَالَ مَا مَكَّنِّي فِيهِ رَبِّي خَيْرٞ فَأَعِينُونِي بِقُوَّةٍ أَجْعَلْ بَيْنَكُمْ وَبَيْنَهُمْ رَدْمًا ﴿٩٥﴾ ءَاتُونِي زُبَرَ ٱلْحَدِيدِۖ حَتَّىٰٓ إِذَا سَاوَىٰ بَيْنَ ٱلصَّدَفَيْنِ قَالَ ٱنفُخُواْۖ حَتَّىٰٓ إِذَا جَعَلَهُۥ نَارٗا قَالَ ءَاتُونِيٓ أُفْرِغْ عَلَيْهِ قِطْرٗا ﴿٩٦﴾ فَمَا ٱسْطَٰعُوٓاْ أَن يَظْهَرُوهُ وَمَا ٱسْتَطَٰعُواْ لَهُۥ نَقْبٗا ﴿٩٧﴾

(٨٤) ئێمە توانا و دەسەلاتمان لە زەویدا پـێ بەخشی بوو، بۆ هەرشتێکی پێویستی ئەو سەردەمە هۆکارەکەیمان بۆ رەخساندبوو.

(٨٥) ئـەویش کـەڵکی تـەواوی لـە هۆکارەکـان وەردەگرت.

(٨٦) (خـۆی و لەشـکرەکەی) کەوتـە رێ هـەتا کاتێک گەیشتە ناوچەکانی خۆرئاوا، (کەوا دەهاتە بەرچاو) لەگۆمێکی قوراودا، رۆژ، ئاوا دەبێت، لەو ناوەدا رێی کەوت لە قـەومێکی (خوانـەناس و بێ دین)، ئێمەش پێمـان وت: ئـەی (ذو القرنـین) یـان ئەوەیە بە سزا لەناویان دەبەیت (ئەگەر لەسەر کوفر و تاوانیـان بـەردەوام بـوون) یـان چاکـەیان لەگـەڵدا دەکەیت (ئەگەر شوێنی ئیمان و چاکە کەوتن).

(٨٧) (ذو القرنـین) وتـی: بێگومـان ئـەوەی ستەمکار بێت ئێمە سزای دەدەین، لەوەودوایش کە گەرایەوە بۆ لای پەروەردگاری سزایەکی زۆر سەخت و گرانی دەدات.

(٨٨) بەڵام ئەوەی ئیمان و بـاوەڕ بـهێنێت و کـارو کردەوەی چاکە ئەنجام بدات، ئەوە پاداشـتی چاک بۆ ئەوە، لەمەودوا قسەی خۆش و فـەرمانی ئاسان وکاری سووکی دەدەین بەسەردا.

(٨٩) لـەوەودوا کـەڵکی تـەواوی لـە هۆکارەکـان وەرگرت و بەشوێنیاندا گەڕا.

(٩٠) هەتا کـاتێک گەیشتە ناوچـەی خۆرهـەلاتی (دوور)، بینی خۆر هـەڵدێت لەسـەر قـەومێک کـە پەناگایەکیان نیە تا لەتینی خۆیان بپارێزن.

(٩١) هەر بەو شێوەیە رەفتاری کرد، کـە لەگـەڵ خـەڵکی خۆرئـاوادا کـردی، بێگومـان ئێمـە بەتـەواویی ئاگـاداربووین لـەو کاروکردەوانەی کە ئەنجامی دەدا.

(٩٢) لەوەودوا هەر دەستبەرداری هۆکراەکان نەبوو، بەشوێنیاندا گەڕا.

(٩٣) هەتا کاتێک گەیشـتە نێـوان هـەردوو بەربەسـتەکە، کـە لـە نێوانیـاندا قـەومێک هـەبوو کـە لـە هیـچ قسـەیەک تـێ نەدەگەیشتن (مەگەر زۆر بەدەگمەن).

(٩٤) کاتێک دەسەلاتی (ذو القرنین) یان بینی وتیان: ئەی (ذو القرنین) بەڕاستی یەئجوج و مەئجوج تۆوی خراپـە و تـاوان دەچێنن لە زەویدا، ئایا خەرجیەک و پارەیەکت بۆ کۆ بکەینەوە، تا بەربەستێک لە نێوان ئێمە و ئەواندا دروست بکەیت؟

(٩٥) (ذو القرنین) وتی: ئەو دەسەلات و زانیاری و شتانەی پەروەردگارم پێی بەخشیووم چاکترە بۆ من (لە پارە و سامان) جا ئێوە بەهێزی بازوو یارمەتیم بدە ن تا بەربەستێکی بەهێز لەنێوان ئێوە و ئەواندا دروست بکەم.

(٩٦) پارچە ئاسنم بۆ بهێنن و (کەڵەکەی بکەن) هەتا ئەمبەرو ئەوبەری هەردوو کێوەکەی پڕ کرد، ئەوسا فەرمانیدا، تـا بـە (موشەدەمە) فوو بکەن لەو ئاگرەی کە لە ژێریدا کرابۆوە، هەتا کاتێک هەمووی کرد بـە ئـاگر، ئینجـا (ذو القرنـین) وتـی: نادەی مسی تواوەم بۆ بهێنن تا بیکەم بەسەریدا (مس لەگەڵ ئاسندا تێکەڵ بکرێت پێکهاتەیەکی بەهێزی لێ دروست دەبێت).

(٩٧) ئەوسا ئیتر (یەئجوج و مەئجوج) نە توانیان سەربکەون، نە توانیان کونناو دەری بکەن.



قَالَ هَٰذَا رَحْمَةٌ مِّن رَّبِّي فَإِذَا جَاءَ وَعْدُ رَبِّي جَعَلَهُ دَكَّاءَ وَكَانَ وَعْدُ رَبِّي حَقًّا ﴿٩٨﴾ وَتَرَكْنَا بَعْضَهُمْ يَوْمَئِذٍ يَمُوجُ فِي بَعْضٍ وَنُفِخَ فِي الصُّورِ فَجَمَعْنَاهُمْ جَمْعًا ﴿٩٩﴾ وَعَرَضْنَا جَهَنَّمَ يَوْمَئِذٍ لِّلْكَافِرِينَ عَرْضًا ﴿١٠٠﴾ الَّذِينَ كَانَتْ أَعْيُنُهُمْ فِي غِطَاءٍ عَن ذِكْرِي وَكَانُوا لَا يَسْتَطِيعُونَ سَمْعًا ﴿١٠١﴾ أَفَحَسِبَ الَّذِينَ كَفَرُوا أَن يَتَّخِذُوا عِبَادِي مِن دُونِي أَوْلِيَاءَ إِنَّا أَعْتَدْنَا جَهَنَّمَ لِلْكَافِرِينَ نُزُلًا ﴿١٠٢﴾ قُلْ هَلْ نُنَبِّئُكُم بِالْأَخْسَرِينَ أَعْمَالًا ﴿١٠٣﴾ الَّذِينَ ضَلَّ سَعْيُهُمْ فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَهُمْ يَحْسَبُونَ أَنَّهُمْ يُحْسِنُونَ صُنْعًا ﴿١٠٤﴾ أُولَٰئِكَ الَّذِينَ كَفَرُوا بِآيَاتِ رَبِّهِمْ وَلِقَائِهِ فَحَبِطَتْ أَعْمَالُهُمْ فَلَا نُقِيمُ لَهُمْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ وَزْنًا ﴿١٠٥﴾ ذَٰلِكَ جَزَاؤُهُمْ جَهَنَّمُ بِمَا كَفَرُوا وَاتَّخَذُوا آيَاتِي وَرُسُلِي هُزُوًا ﴿١٠٦﴾ إِنَّ الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ كَانَتْ لَهُمْ جَنَّاتُ الْفِرْدَوْسِ نُزُلًا ﴿١٠٧﴾ خَالِدِينَ فِيهَا لَا يَبْغُونَ عَنْهَا حِوَلًا ﴿١٠٨﴾ قُل لَّوْ كَانَ الْبَحْرُ مِدَادًا لِّكَلِمَاتِ رَبِّي لَنَفِدَ الْبَحْرُ قَبْلَ أَن تَنفَدَ كَلِمَاتُ رَبِّي وَلَوْ جِئْنَا بِمِثْلِهِ مَدَدًا ﴿١٠٩﴾ قُلْ إِنَّمَا أَنَا بَشَرٌ مِّثْلُكُمْ يُوحَىٰ إِلَيَّ أَنَّمَا إِلَٰهُكُمْ إِلَٰهٌ وَاحِدٌ فَمَن كَانَ يَرْجُو لِقَاءَ رَبِّهِ فَلْيَعْمَلْ عَمَلًا صَالِحًا وَلَا يُشْرِكْ بِعِبَادَةِ رَبِّهِ أَحَدًا ﴿١١٠﴾

(٩٨) (ئەوسا ذو القرنين) وتی: دروستکردنی ئەم بەربەستە رەحمەتێک بوو لەلایەن پەروەردگارمەوە، ئینجا کاتێک پەروەردگارم بڕیاری تێکدانی بدات، ورد و خاشی دەکات، بێگومان بەڵێنی پەروەردگارم حەقیقەت و راستەقینەیە.

(٩٩) لەو رۆژە بەدواوە وازمان لێهێنان تا وەک شەپۆل بەناو یەکدا بێن، یاخود وازمان لێهێنان بۆ ئەو رۆژەی (کە بەربەستەکە دەشکێت و بەپەلە) وەکو لێشاودێنە دەرێ و شەپۆل دەدەن بەناو یەکدا (کە یەکێکە لە نیشانەکانی کۆتایی هاتنی دنیا)، ئەوسا فوو دەکرێت بە ـ صور ـ دا، بەو هۆیەوە هەر هەموو خەڵکی بە تەواوی کۆ دەکەینەوە (بۆ موحاسەبە و لێپرسینەوە).

(١٠٠) ئیتر ئەو رۆژە دۆزەخ نیشانی کافران دەدەین و بەتەواوی دەری دەخەین (هەموشیانی تیادا کۆ دەکەینەوە).

(١٠١) ئەوانەی کە پەردە بەسەر چاویاندا هاتبوو (نەیاندەویست نیشانەکانی دەسەڵاتداری ئێمە ببینن)و یادی ئێمە بکەن و توانای بیستنی (قورئانی ئێمەیان نەبوو، حەزیان لێ نەدەکرد).

(١٠٢) ئایا ئەوانەی کافرو بێباوەڕ بوون وا دەزانن کە هەروا بۆیان دەچێتە سەرو چاوپۆشییان لێ دەکەین لەکاتێکدا کە ئەوان بەندەکانی ئێمە دەکەنە یارو یاوەری خۆیان و پشت بەوان دەبەستن و ئێمە فەرامۆش دەکەن، ئەوانە بابزانن کە بەڕاستی ئێمە دۆزەخمان ئامادەکردووە بۆ بێباوەڕان کەلەوێ دادەبەزن و نیشتەجێ دەبن.

(١٠٣) ئەی محمد ﷺ پێیان بڵێ: ئایا هەواڵی ئەو کەسانەتان بدەمێ کە لە کارو کردەوەیاندا زۆر زەرەرمەند و خەسارەتمەندن؟!

(١٠٤) (ئەوانە) ئەو کەسانەن کە هەوڵ و کۆششیان لەژیانی دنیادا، بەزایە و بەهەدەر چووە بەمەرجێک وایان دەزانی کە بەڕاستی کاری چاک دەکەن و کردەوەی رەوا ئەنجام دەدەن.

(١٠٥) ئەوانە کەسانێکن کە باوەڕیان بە بەڵگەو نیشانەکانی پەروەردگاریان نەبووەو بەنیازی ئامادەبوونی بەردەم بارەگای خوایی نەبوون، ئیتر هەموو کارو کردەوەکانیان بێ نرخ و پووچ بووەوە، لە رۆژی قیامەتیشدا هیچ جۆرە بایەخ و نرخێکیان بۆ دانانێین.

(١٠٦) ئەوانە پاداشتیان ئاگری دۆزەخە بەهۆی ئەوەی کە باوەڕیان نەبوو و گاڵتەجاڕیان بەبەڵگەو نیشانەکان و پێغەمبەرانی ئێمەکرد

(١٠٧) بەڕاستی ئەوانەی کە ئیمان و باوەڕیان هێناوەو کردەوە چاکەکانیان ئەنجامداوە، ئێمە هەر لە زووەوە بەهەشتی فیردەوسمان بۆ ئامادە کردوون، تا لەوێ دابەزن و ژیانی کامەرانی تیایدا بەرنەسەر.

(١٠٨) ژیانیان تیایدا بەردەوام و نەبڕاوەیە، نایانەوێت بگوێزرێنەوە بۆ شوێنێکی تر (لەبەر چاویان ناکەوێت).

(١٠٩) پێیان بڵێ: ئەگەر دەریا هەمووی مرەکەب بێت و زانست و زانیاری پەروەردگارمی پێ بنووسرایە، دەریا تەواو دەبوو پێش ئەوەی زانست و زانیاری پەروەردگارم تەواو ببێت، ئەگەر چەندەها ئەوەندەی تر دەریاش بهێنن و بیکەنە مرەکەب، چونکە زانست و زانیاری پەروەردگار کۆتایی نایە و بێسنوورە.

(١١٠) (ئەی پێغەمبەرﷺ پێیان) بڵێ: بەڕاستی من تەنها ئادەمیزادێکم وەک ئێوە، بەڵام ئەوەندە هەیە وەحی و نیگام بۆ دێت (ئەم راستیەتان تێبگەیەنم) کە: بێگومان خوای ئێوە خوایەکی تاک و تەنهایە، جائەوەی دەیەوێت بەدیداری پەروەردگاری شادببێت، بەخۆشنودیەوە با کارو کردەوەی چاک و دروست ئەنجام بدات و بەهیچ شێوەیەک لە پەرستنیدا هیچ کەسێک نەکاتە هاوەڵ و شەریک بۆی.

سُورَةُ مَرْيَمَ

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

كٓهيعٓصٓ ﴿١﴾ ذِكْرُ رَحْمَتِ رَبِّكَ عَبْدَهُۥ زَكَرِيَّآ ﴿٢﴾ إِذْ نَادَىٰ رَبَّهُۥ نِدَآءً خَفِيًّا ﴿٣﴾ قَالَ رَبِّ إِنِّى وَهَنَ ٱلْعَظْمُ مِنِّى وَٱشْتَعَلَ ٱلرَّأْسُ شَيْبًا وَلَمْ أَكُنۢ بِدُعَآئِكَ رَبِّ شَقِيًّا ﴿٤﴾ وَإِنِّى خِفْتُ ٱلْمَوَٰلِىَ مِن وَرَآءِى وَكَانَتِ ٱمْرَأَتِى عَاقِرًا فَهَبْ لِى مِن لَّدُنكَ وَلِيًّا ﴿٥﴾ يَرِثُنِى وَيَرِثُ مِنْ ءَالِ يَعْقُوبَ ۖ وَٱجْعَلْهُ رَبِّ رَضِيًّا ﴿٦﴾ يَٰزَكَرِيَّآ إِنَّا نُبَشِّرُكَ بِغُلَٰمٍ ٱسْمُهُۥ يَحْيَىٰ لَمْ نَجْعَل لَّهُۥ مِن قَبْلُ سَمِيًّا ﴿٧﴾ قَالَ رَبِّ أَنَّىٰ يَكُونُ لِى غُلَٰمٌ وَكَانَتِ ٱمْرَأَتِى عَاقِرًا وَقَدْ بَلَغْتُ مِنَ ٱلْكِبَرِ عِتِيًّا ﴿٨﴾ قَالَ كَذَٰلِكَ قَالَ رَبُّكَ هُوَ عَلَىَّ هَيِّنٌ وَقَدْ خَلَقْتُكَ مِن قَبْلُ وَلَمْ تَكُ شَيْـًٔا ﴿٩﴾ قَالَ رَبِّ ٱجْعَل لِّىٓ ءَايَةً ۚ قَالَ ءَايَتُكَ أَلَّا تُكَلِّمَ ٱلنَّاسَ ثَلَٰثَ لَيَالٍ سَوِيًّا ﴿١٠﴾ فَخَرَجَ عَلَىٰ قَوْمِهِۦ مِنَ ٱلْمِحْرَابِ فَأَوْحَىٰٓ إِلَيْهِمْ أَن سَبِّحُوا۟ بُكْرَةً وَعَشِيًّا ﴿١١﴾

سورەتی (مریم)

بەناوی خوای بەخشندە و میهرەبان

(١) سەرنجی سەرەتای سورەتی (البقرة) بدە.

(٢) (ئەی پێغەمبەرﷺ ، ئەم باسە) باسی رەحمەتی پەروەردگارتە، دەربارەی بەندەی خۆی زەکەریا.

(٣) کاتێک لە(پەرستگای خۆیدا) هانا و هاواری برد بۆ پەروەردگاری بەپەنهانی.

(٤) وتی: پەروەردگارا، بەڕاستی من ئێسکەکانم لاواز بوون و قژی سەرم هەر هەمووی سپێتی دایگرتووە، بەلاّم من هەرگیز لە دوعاو پاڕانەوەم لە زاتی تۆ نائومێد نەبووم و (دەستت نەناوە بەرووممەوە).

(٥) بەڕاستی من لەوە ترساوم کە خزم و خوێشان و عەشرەت دوای مردنم سەرگەردان بن، (چونکە کەسێکی وایان تیادا بەدی ناکەم کە شایستەی گەیاندنی پەیامەکەت بێت، خۆت دەزانیت) خێزانەکەشم منداڵی نابێت، بۆیە داواکارم لەبەخششی خۆت بەهرەوەرم بکە و منداڵێکم پێ ببەخشیت کە بتوانێت جێگەی من بگرێتەوە.

(٦) تا میراتی پێغەمبەرایەتی من و نەوەی یەعقوب وەربگرێت، هەروەها پەروەردگارا بیکە بەکەسێکی وا، کە تۆش و بەندە چاکەکانیشت لێی رازی بن (ئەوەندە چاکەکارو چاکەخوازو دیندار بێت).

(٧) خوای گەورە نزاکەی گیراکردو فەرمووی: ئەی زەکەریا بەڕاستی ئێمە مژدەت دەدەینێ بەوەی کە کوڕێکت پێ دەبەخشین و ناویشی ـ یەحیا ـ یە، پێش ئەو کەسمان هاوناوی ئەو نەکردووە.

(٨) زەکەریا وتی: پەروەردگارا بە چ شێوەیەک کوڕم پێ دەبەخشیت، لەکاتێکدا هاوسەرەکەشم منداڵی نابێت و منیش گەیشتوومەتە ئەوپەڕی پیری و پەککەوتەیی (بەلاّم هەمووشت لای تۆ ئاسانە).

(٩) وتی: پەروەردگاری تۆ هەر بەو شێوەیە بڕیاری داوە و فەرمووشیەتی ئەوکارە لای من زۆر ئاسانە، بەڕاستی پێش تریش تۆم دروستکردووە، وەنەبێت شتێک بوو بیت (نە ناوت هەبووە نە بوون)...

(١٠) زەکەریا وتی: پەروەردگارا نیشانەیەکم پێ ببەخشە تادڵنیابم، کە ئەو مژدەیە هاتۆتەدی، خوای گەورە فەرمووی: نیشانە و بەڵگەت ئەوەیە (لەسەر بوونی ئەو کوڕە) کە تۆ ناتوانیت سێ شەوی تەواو (بە ڕۆژەکانیەوە) قسە لەگەڵ خەڵکیدا بکەیت!

(١١) (ئەوسا دوای دڵنیابوون) لە پەرستگاکەی هاتە دەرەوە بۆ ناو قەومەکەی و ئاماژەی بۆ کردن (کە لە بەرامبەر نازو نیعمەت و بەخششەکانی خواوە) بەیانیان و ئێواران تەسبیحات و ستایش بکەن.

يَٰيَحْيَىٰ خُذِ ٱلْكِتَٰبَ بِقُوَّةٍ وَءَاتَيْنَٰهُ ٱلْحُكْمَ صَبِيًّا ﴿١٢﴾ وَحَنَانًا مِّن لَّدُنَّا وَزَكَوٰةً وَكَانَ تَقِيًّا ﴿١٣﴾ وَبَرًّا بِوَٰلِدَيْهِ وَلَمْ يَكُن جَبَّارًا عَصِيًّا ﴿١٤﴾ وَسَلَٰمٌ عَلَيْهِ يَوْمَ وُلِدَ وَيَوْمَ يَمُوتُ وَيَوْمَ يُبْعَثُ حَيًّا ﴿١٥﴾ وَٱذْكُرْ فِى ٱلْكِتَٰبِ مَرْيَمَ إِذِ ٱنتَبَذَتْ مِنْ أَهْلِهَا مَكَانًا شَرْقِيًّا ﴿١٦﴾ فَٱتَّخَذَتْ مِن دُونِهِمْ حِجَابًا فَأَرْسَلْنَآ إِلَيْهَا رُوحَنَا فَتَمَثَّلَ لَهَا بَشَرًا سَوِيًّا ﴿١٧﴾ قَالَتْ إِنِّىٓ أَعُوذُ بِٱلرَّحْمَٰنِ مِنكَ إِن كُنتَ تَقِيًّا ﴿١٨﴾ قَالَ إِنَّمَآ أَنَا۠ رَسُولُ رَبِّكِ لِأَهَبَ لَكِ غُلَٰمًا زَكِيًّا ﴿١٩﴾ قَالَتْ أَنَّىٰ يَكُونُ لِى غُلَٰمٌ وَلَمْ يَمْسَسْنِى بَشَرٌ وَلَمْ أَكُ بَغِيًّا ﴿٢٠﴾ قَالَ كَذَٰلِكِ قَالَ رَبُّكِ هُوَ عَلَىَّ هَيِّنٌ وَلِنَجْعَلَهُۥٓ ءَايَةً لِّلنَّاسِ وَرَحْمَةً مِّنَّا وَكَانَ أَمْرًا مَّقْضِيًّا ﴿٢١﴾ ۞ فَحَمَلَتْهُ فَٱنتَبَذَتْ بِهِۦ مَكَانًا قَصِيًّا ﴿٢٢﴾ فَأَجَآءَهَا ٱلْمَخَاضُ إِلَىٰ جِذْعِ ٱلنَّخْلَةِ قَالَتْ يَٰلَيْتَنِى مِتُّ قَبْلَ هَٰذَا وَكُنتُ نَسْيًا مَّنسِيًّا ﴿٢٣﴾ فَنَادَىٰهَا مِن تَحْتِهَآ أَلَّا تَحْزَنِى قَدْ جَعَلَ رَبُّكِ تَحْتَكِ سَرِيًّا ﴿٢٤﴾ وَهُزِّىٓ إِلَيْكِ بِجِذْعِ ٱلنَّخْلَةِ تُسَٰقِطْ عَلَيْكِ رُطَبًا جَنِيًّا ﴿٢٥﴾



(١٢) (پاشان کە یەحیا گەورە بوو فەرمانمان پێدا) ئەی یەحیا کتێبی (تەورات) بەتوندی بگرەو پابەندی بەو هەر لە تەمەنی نەوجەوانیدا، توانای جیاکردنەوەی راست و ناراستمان پێبەخشی، بە دادوەریەکی رێک و پێک کێشەی خەڵکەکەی چارەسەر دەکرد.

(١٣) یەحیا دڵ و دەروونێکی پڕ لە سۆزو خۆشەویستی و پاک و خاوێنی هەبوو کە لەلایەن خۆمانەوە پێمان بەخشیبوو و ئەو زۆر خواناس و پارێزکار بوو.

(١٤) هەروەها چاک رەفتارو جوان رەفتار بوو لەگەڵ باوک و دایکیدا، وەنەبێت ئەو کەسێکی دڵڕەق و یاخی و نالەبار بوو بێت.

(١٥) درودو سەلامی خوای لەسەر بێت لەو رۆژەدا کە لە دایک بوو و لەو رۆژەدا کە وەفات دەکات، لەو رۆژەشدا کە هەڵدەستێت و زیندوو دەبێتەوە.

(١٦) ئەی پێغەمبەر ﷺ لە قورئاندا باسی بەسەرهاتی مەریەم یاد بکە، کاتێک کەنارگیری کرد لە کەسوکاری و شوێنێکی لە رۆژهەڵاتی (بیت المقدس) هەڵبژارد (بۆ خواپەرستی).

(١٧) ئینجا لەنێوان خۆی و ئەواندا پەردەیەکی رایەڵ کرد (تادوور لەخەڵکی بەسۆزەوە خواپەرستی بکات) ئێمەش جوبرەئیلی فریشتەمان نارد بۆ لای، وەکو بەشەرێکی تەواو (خۆی خستە بەرچاوی).

(١٨) مەریەم وتی: بەڕاستی من پەنا دەگرم بەخوای میهرەبان لە تۆ ئەگەر کەسێکی بە تەقواو لەخواترس بیت.

(١٩) جوبرەئیل وتی: (مەترسە) دڵنیابە من تەنها نێردراوی پەروەردگاری تۆم، تا منداڵێکی خاوێنت پێ ببەخشم.

(٢٠) مەریەم وتی: جا چۆن من منداڵم دەبێت، لەکاتێکدا هیچ بەشەرێک توخنم نەکەوتووە و داوێن پیسیش نەبووم.

(٢١) جوبرەئیل وتی: ئەو قسانەی تۆ راست و دروستن، بەڵام ئەوە بریاری پەروەردگارە و دەفەرموێت: ئەوکارە لای من ئاسانە (کە بەبێ باوک ئەو منداڵە بهێنمە کایەوە)، بۆ ئەوەی بیکەمە نیشانەو موعجیزەیەک بۆ خەڵکی، هەروەها رەحمەتێکی تایبەتیش بێت لەلایەن ئێمەوە، ئیتر ئەو کارەش بریاری لەسەر دراوە و براوەتەوە.

(٢٢) دەستبەجێ مەریەم سکی پڕ بوو، (بەغەم و پەژارەوە) بەرەو شوێنێکی دوور رۆیشت.

(٢٣) ئینجا ژانی منداڵبوون گرتی و بردی بۆ لای قەدی دارخورمایەک، (بەدەم ئاهو ناڵەوە) دەیوت: خۆزگە پێش ئەم حاڵەتە بمردمایەو وەک شتێکی بێ نرخ فەرامۆش بکرامایە.

(٢٤) (ئەو منداڵەی کە لە داوێنی بەربۆوە) لە ژێریەوە (بانگی کردو وتی: دایە گیان) خەفەت مەخۆ، ئەوەتە پەروەردگارت بە بەردەمتدا جۆگەلەیەکی جاری کردووە.

(٢٥) ئەو دارخورمایەش (کە پاڵت پێوەداوە) کەمێک رایوەشێنە خورمای گەییوت بەسەردا دەبارێنێت.

فَكُلِي وَٱشْرَبِي وَقَرِّي عَيْنًا فَإِمَّا تَرَيِنَّ مِنَ ٱلْبَشَرِ أَحَدًا فَقُولِيٓ إِنِّي نَذَرْتُ لِلرَّحْمَٰنِ صَوْمًا فَلَنْ أُكَلِّمَ ٱلْيَوْمَ إِنسِيًّا ﴿٢٦﴾ فَأَتَتْ بِهِۦ قَوْمَهَا تَحْمِلُهُۥ قَالُوا۟ يَٰمَرْيَمُ لَقَدْ جِئْتِ شَيْـًٔا فَرِيًّا ﴿٢٧﴾ يَٰٓأُخْتَ هَٰرُونَ مَا كَانَ أَبُوكِ ٱمْرَأَ سَوْءٍ وَمَا كَانَتْ أُمُّكِ بَغِيًّا ﴿٢٨﴾ فَأَشَارَتْ إِلَيْهِ قَالُوا۟ كَيْفَ نُكَلِّمُ مَن كَانَ فِي ٱلْمَهْدِ صَبِيًّا ﴿٢٩﴾ قَالَ إِنِّي عَبْدُ ٱللَّهِ ءَاتَىٰنِيَ ٱلْكِتَٰبَ وَجَعَلَنِي نَبِيًّا ﴿٣٠﴾ وَجَعَلَنِي مُبَارَكًا أَيْنَ مَا كُنتُ وَأَوْصَٰنِي بِٱلصَّلَوٰةِ وَٱلزَّكَوٰةِ مَا دُمْتُ حَيًّا ﴿٣١﴾ وَبَرًّۢا بِوَٰلِدَتِي وَلَمْ يَجْعَلْنِي جَبَّارًا شَقِيًّا ﴿٣٢﴾ وَٱلسَّلَٰمُ عَلَيَّ يَوْمَ وُلِدتُّ وَيَوْمَ أَمُوتُ وَيَوْمَ أُبْعَثُ حَيًّا ﴿٣٣﴾ ذَٰلِكَ عِيسَى ٱبْنُ مَرْيَمَ قَوْلَ ٱلْحَقِّ ٱلَّذِي فِيهِ يَمْتَرُونَ ﴿٣٤﴾ مَا كَانَ لِلَّهِ أَن يَتَّخِذَ مِن وَلَدٍ سُبْحَٰنَهُۥٓ إِذَا قَضَىٰٓ أَمْرًا فَإِنَّمَا يَقُولُ لَهُۥ كُن فَيَكُونُ ﴿٣٥﴾ وَإِنَّ ٱللَّهَ رَبِّي وَرَبُّكُمْ فَٱعْبُدُوهُ هَٰذَا صِرَٰطٌ مُّسْتَقِيمٌ ﴿٣٦﴾ فَٱخْتَلَفَ ٱلْأَحْزَابُ مِنۢ بَيْنِهِمْ فَوَيْلٌ لِّلَّذِينَ كَفَرُوا۟ مِن مَّشْهَدِ يَوْمٍ عَظِيمٍ ﴿٣٧﴾ أَسْمِعْ بِهِمْ وَأَبْصِرْ يَوْمَ يَأْتُونَنَا لَٰكِنِ ٱلظَّٰلِمُونَ ٱلْيَوْمَ فِي ضَلَٰلٍ مُّبِينٍ ﴿٣٨﴾

(٢٦) ئینجا لەو خورمایە بخۆ، لەو ئاوەیش بخۆرەوە، خەمیشت نەبێت، ئەگەر کەسێکت لە خەڵکی بینی و (پرسیاری لێ کردی)، ئەوە بە ئیشارەت تێی بگەیەنە پێی بڵێ: بەڕاستی من بڕیارمداوە و نەزرم کردووە بە ڕۆژوو بم بۆ خوای میهرەبانم، لەبەر ئەوە ئەمڕۆ من هەرگیز قسە لەگەڵ کەسدا ناکەم.

(٢٧) ئەوسا مەریەم منداڵی نازداری خۆی لە باوەش گرت و بردی بۆ لای خزم و کەس و کاری (هەموو بەسەرسامیەوە) وتیان: ئەی مەریەم بەڕاستی کارێکی نالەبارو ناپرووبەرت ئەنجامداوە.

(٢٨) ئەی خوشکی هاروون (لەبەر تەقواو خواناسی ئەو ناز ناوەیان پێدابوو) تۆ نە باوکت کەسێکی خراپ و (شەروال پیس بووە) نە دایکیشت نافرەتێکی داوێن پیس!!

(٢٩) (مەریەمیش هیچی نەگوت) بەڵکو ئاماژەی بۆ ڕۆڵەی نازداری کرد (تا لەو بپرسن)، هەموو (بە سەرسامیەوە) وتیان: چۆن قسە لەگەڵ منداڵی ناو بێشکەدا دەکرێت.

(٣٠) (ئینجا منداڵی ساوا هاتە گفت و بەدەنگە ناسکەکەی) وتی: بەڕاستی من بەندەی خوام، کتێبی ئینجیلی پێ بەخشیووم و کردوومی بە پێغەمبەری خۆی.

(٣١) منی موبارەک و پیرۆزیش کردووە لە هەر کوێدا بم و ئامۆژگاری کردووم کە نوێژەکانم ئەنجام بدەم و لە زەکاتدانیش درێغی نەکەم هەتا لە ژیاندا هەم.

(٣٢) (هەروەها فەرمانی پێداوم کە) چاک ڕەفتار بم لەگەڵ دایکم دا و نەیکردووم بەکەسێکی زۆردارو بەدرەفتار...

(٣٣) سڵاوی پەروەردگارم لەسەرە ئەو ڕۆژەی کە لەدایک بووم و ئەو ڕۆژەش کە دەمرم، ئەو ڕۆژەش کە زیندوو دەکرێمەوە.

(٣٤) ئا ئەوەیە عیسای کوڕی مەریەم، هەر ئەوەشە قسەی ڕاست و دروست دەربارەی، کە ئەوانە (واتە جووەکان) گومان بەدەوریدا دروست دەکەن (گاوران، بەکوڕی خوا لە قەڵەمی دەدەن).

(٣٥) بێگومان ناگونجێت بۆ خوای گەورە، کەس بکاتە ڕۆڵەی خۆی (چونکە پێویستی پێی نیە) پاکی و بێگەردی شایستەی ئەوە، کاتێک هەرشتێک بڕیار بدات، ئەوە بەڕاستی تەنها ئەوەندەی دەوێت کە فەرمان بدات و بڵێت: ببە، دەستبەجێ دەبێت.

(٣٦) بەڕاستی هەر خوا پەروەردگاری منیش و پەروەردگاری ئێوەشە، کەوابوو بیپەرستن، ئەمەیە ڕێبازی ڕاست و دروست (ڕێبازی دینداری و سەرفرازی هەردوو جیهان).

(٣٧) (لەگەڵ ئەو هەموو ڕاستیانەدا) ئینجا یەکسەر گرۆ دەستەکان لە نێو خۆیاندا راو بۆچوونی جیاوازیان بۆ پەیدا بوو، هاوارو ئاهو ناڵە بۆ ئەوانەی کە بێ باوەڕن و (بڕوا بەو ڕاستیانە ناکەن) کاتێک قیامەت بەرپا دەبێت و دیمەنی سامناک و بەسەرهاتی گەورە دەبینن (کە ئێستە بەدووری دەزانن).

(٣٨) ئەو ڕۆژەی (کە ئەو خوانەناسانە) ئامادە دەکرێن و دێن بۆ لامان، (زۆر سەیرە!) ئای کە چەندە دەزگای بیستن و بینینیان بەهێزە، بەڵام ستەمکاران ئەمڕۆ لە گومڕاییەکی ئاشکرادا دەژین.

وَأَنذِرْهُمْ يَوْمَ ٱلْحَسْرَةِ إِذْ قُضِىَ ٱلْأَمْرُ وَهُمْ فِى غَفْلَةٍ وَهُمْ لَا يُؤْمِنُونَ ﴿٣٩﴾ إِنَّا نَحْنُ نَرِثُ ٱلْأَرْضَ وَمَنْ عَلَيْهَا وَإِلَيْنَا يُرْجَعُونَ ﴿٤٠﴾ وَٱذْكُرْ فِى ٱلْكِتَٰبِ إِبْرَٰهِيمَ إِنَّهُۥ كَانَ صِدِّيقًا نَّبِيًّا ﴿٤١﴾ إِذْ قَالَ لِأَبِيهِ يَٰٓأَبَتِ لِمَ تَعْبُدُ مَا لَا يَسْمَعُ وَلَا يُبْصِرُ وَلَا يُغْنِى عَنكَ شَيْـًٔا ﴿٤٢﴾ يَٰٓأَبَتِ إِنِّى قَدْ جَآءَنِى مِنَ ٱلْعِلْمِ مَا لَمْ يَأْتِكَ فَٱتَّبِعْنِىٓ أَهْدِكَ صِرَٰطًا سَوِيًّا ﴿٤٣﴾ يَٰٓأَبَتِ لَا تَعْبُدِ ٱلشَّيْطَٰنَ إِنَّ ٱلشَّيْطَٰنَ كَانَ لِلرَّحْمَٰنِ عَصِيًّا ﴿٤٤﴾ يَٰٓأَبَتِ إِنِّىٓ أَخَافُ أَن يَمَسَّكَ عَذَابٌ مِّنَ ٱلرَّحْمَٰنِ فَتَكُونَ لِلشَّيْطَٰنِ وَلِيًّا ﴿٤٥﴾ قَالَ أَرَاغِبٌ أَنتَ عَنْ ءَالِهَتِى يَٰٓإِبْرَٰهِيمُ لَئِن لَّمْ تَنتَهِ لَأَرْجُمَنَّكَ وَٱهْجُرْنِى مَلِيًّا ﴿٤٦﴾ قَالَ سَلَٰمٌ عَلَيْكَ سَأَسْتَغْفِرُ لَكَ رَبِّىٓ إِنَّهُۥ كَانَ بِى حَفِيًّا ﴿٤٧﴾ وَأَعْتَزِلُكُمْ وَمَا تَدْعُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ وَأَدْعُوا۟ رَبِّى عَسَىٰٓ أَلَّآ أَكُونَ بِدُعَآءِ رَبِّى شَقِيًّا ﴿٤٨﴾ فَلَمَّا ٱعْتَزَلَهُمْ وَمَا يَعْبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ وَهَبْنَا لَهُۥٓ إِسْحَٰقَ وَيَعْقُوبَ وَكُلًّا جَعَلْنَا نَبِيًّا ﴿٤٩﴾ وَوَهَبْنَا لَهُم مِّن رَّحْمَتِنَا وَجَعَلْنَا لَهُمْ لِسَانَ صِدْقٍ عَلِيًّا ﴿٥٠﴾ وَٱذْكُرْ فِى ٱلْكِتَٰبِ مُوسَىٰٓ إِنَّهُۥ كَانَ مُخْلَصًا وَكَانَ رَسُولًا نَّبِيًّا ﴿٥١﴾

(٣٩) ئەی پێغەمبەرﷺ، ستەمكاران ئاگادار بكە لە ڕۆژی ئاهو ناڵە و پەشیمانی كاتێك كار لە كار ترازاوە، لەكاتێكدا ئەوانە لە غەفڵەتدان و باوەڕ ناهێنن.

(٤٠) بەڕاستی سەرەنجام هەرئێمە دەبینەوە خاوەن و میراتگری سەر زەوی و هەموو ئەوانەی كە لە سەریەتی و بۆ لای ئێمەش دەگەڕێنەوە.

(٤١) هەروەها لە قورئاندا باسی (گۆشەیەك لە بەسەرهاتی) ئیبراهیم بۆ ئەو خەڵكە بگێڕەوە، بەڕاستی ئەو كەسایەتیەكی ڕاستگۆ بوو، لە پێغەمبەرانیش بوو.

(٤٢) كاتێك بەباوكی وت: باوكی بەڕێزم! ئەوە تۆ بۆچی شتێك دەپەرستیت كە نەگوێ بیستە، نەكەس بەرچاو ڕوون و ڕۆشنبیر دەكات، نە هیچ سوودێكت پێ دەگەیەنێت.

(٤٣) ئەی باوكی بەنرخم! بەڕاستی ئەو زانستی و زانیاریەی كە بۆ من هاتووە، (دەربارەی دەسەڵات و توانای بەدیهێنەری ئەم جیهانە) بێگومان بۆ تۆ نەهاتووە، كەواتە پەیڕەوی من بكە ڕێنموویت دەكەم بۆ ڕێگە و ڕێبازێكی ڕاست و دروست.

(٤٤) ئەی باوكی نازیزم! شەیتان مەپەرستە، چونكە بەڕاستی شەیتان یاخیە لە خوای میهرەبان و سەركەشیی كردووە.

(٤٥) ئەی باوكی بەڕێزم! بەڕاستی من دەترسم سزایەك لەلایەن خوای میهرەبانەوە یەخەت پێ بگرێت، ئەوكاتە ئیتر دەبیتە یارو یاوەرو پشتگیری شەیتان.

(٤٦) (باوكی ئیبراهیم بەسەغڵەتیەوە) وتی: بۆچی ئەی ئیبراهیم تۆ (ئەوەندە) لە خواكانی من بێزاری، بەڕاستی ئەگەر كۆڵ نەدەیت و واز نەهێنیت (چاوپۆشیت لێ ناكەم و) بێگومان بەرد بارانت دەكەم، بڕۆ، ون بە لەبەرچاوم هەر نەتبینمەوە.

(٤٧) ئیبراهیم وتی: سڵاوت لێ بێت (وا من دەڕۆم) لەمەولا داوای لێخۆشبوون و (هیدایەتت) لە پەروەردگارم بۆ دەخوازم، چونكە ئەو زاتە زۆر منی خۆش دەوێت و ڕێزی بۆ داناوم.

(٤٨) وا من دوور دەكەومەوە و كەنارگیری دەكەم، لە ئێوە و لەو شتانەی كە لەجیاتی خوا دەیپەرستن، من تەنها هاناو هاوار بۆ پەروەردگارم دەبەم و هەر ئەو دەپەرستم، ئومێدەوارم كە پەروەردگارم نائومێد و ڕەنجەڕۆم نەكات و دوعاو نزاو پەرستنم لێ وەربگرێت.

(٤٩) جا كاتێك ئیبراهیم ڕۆیشت و دوور كەوتەوە لەو خەڵكە گومڕایە و لەو شتانەی كە لە جیاتی خوا دەیانپەرست، ئێمە ئیسحاقمان پێبەخشی و بە ئیسحاقیش، یەعقوبمان بەخشی، هەریەك لەوانیشمان كردە پێغەمبەر.

(٥٠) ئێمە لە ڕەحم و بەخشندەیی خۆشمان هەموویانمان بەهرەوەر كردو ئێمە زمانی خەڵكی دیندارمان هێناوەتە گۆ كە (هەتا دنیا دنیایە) باسی ئەوانە بەچاكی و پاكی و بڵندی بكەن.

(٥١) یادی موساش باس بكە لە قورئاندا، بەڕاستی ئەویش كەسێكی هەڵبژاردە و دڵسۆزو پێغەمبەرو فرستادە بوو.

وَنَٰدَيۡنَٰهُ مِن جَانِبِ ٱلطُّورِ ٱلۡأَيۡمَنِ وَقَرَّبۡنَٰهُ نَجِيّٗا ﴿٥٢﴾ وَوَهَبۡنَا لَهُۥ مِن رَّحۡمَتِنَآ أَخَاهُ هَٰرُونَ نَبِيّٗا ﴿٥٣﴾ وَٱذۡكُرۡ فِي ٱلۡكِتَٰبِ إِسۡمَٰعِيلَۚ إِنَّهُۥ كَانَ صَادِقَ ٱلۡوَعۡدِ وَكَانَ رَسُولٗا نَّبِيّٗا ﴿٥٤﴾ وَكَانَ يَأۡمُرُ أَهۡلَهُۥ بِٱلصَّلَوٰةِ وَٱلزَّكَوٰةِ وَكَانَ عِندَ رَبِّهِۦ مَرۡضِيّٗا ﴿٥٥﴾ وَٱذۡكُرۡ فِي ٱلۡكِتَٰبِ إِدۡرِيسَۚ إِنَّهُۥ كَانَ صِدِّيقٗا نَّبِيّٗا ﴿٥٦﴾ وَرَفَعۡنَٰهُ مَكَانًا عَلِيًّا ﴿٥٧﴾ أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ أَنۡعَمَ ٱللَّهُ عَلَيۡهِم مِّنَ ٱلنَّبِيِّـۧنَ مِن ذُرِّيَّةِ ءَادَمَ وَمِمَّنۡ حَمَلۡنَا مَعَ نُوحٖ وَمِن ذُرِّيَّةِ إِبۡرَٰهِيمَ وَإِسۡرَٰٓءِيلَ وَمِمَّنۡ هَدَيۡنَا وَٱجۡتَبَيۡنَآۚ إِذَا تُتۡلَىٰ عَلَيۡهِمۡ ءَايَٰتُ ٱلرَّحۡمَٰنِ خَرُّواْۤ سُجَّدٗاۤ وَبُكِيّٗا۩ ﴿٥٨﴾ ۞ فَخَلَفَ مِنۢ بَعۡدِهِمۡ خَلۡفٌ أَضَاعُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَٱتَّبَعُواْ ٱلشَّهَوَٰتِۖ فَسَوۡفَ يَلۡقَوۡنَ غَيًّا ﴿٥٩﴾ إِلَّا مَن تَابَ وَءَامَنَ وَعَمِلَ صَٰلِحٗا فَأُوْلَٰٓئِكَ يَدۡخُلُونَ ٱلۡجَنَّةَ وَلَا يُظۡلَمُونَ شَيۡـٔٗا ﴿٦٠﴾ جَنَّٰتِ عَدۡنٍ ٱلَّتِي وَعَدَ ٱلرَّحۡمَٰنُ عِبَادَهُۥ بِٱلۡغَيۡبِۚ إِنَّهُۥ كَانَ وَعۡدُهُۥ مَأۡتِيّٗا ﴿٦١﴾ لَّا يَسۡمَعُونَ فِيهَا لَغۡوًا إِلَّا سَلَٰمٗاۖ وَلَهُمۡ رِزۡقُهُمۡ فِيهَا بُكۡرَةٗ وَعَشِيّٗا ﴿٦٢﴾ تِلۡكَ ٱلۡجَنَّةُ ٱلَّتِي نُورِثُ مِنۡ عِبَادِنَا مَن كَانَ تَقِيّٗا ﴿٦٣﴾ وَمَا نَتَنَزَّلُ إِلَّا بِأَمۡرِ رَبِّكَۖ لَهُۥ مَا بَيۡنَ أَيۡدِينَا وَمَا خَلۡفَنَا وَمَا بَيۡنَ ذَٰلِكَۚ وَمَا كَانَ رَبُّكَ نَسِيّٗا ﴿٦٤﴾



(٥٢) لەلای راستی کێوی ـ طور ـ ەوە بانگمان لێ کرد، لەکاتی گفتوگۆی نهێنیدا نزیکمان خستەوە.

(٥٣) هەروەها بەرەحمەت و بەخشندەیی خۆمان هارونی برایمان کردە پێغەمبەر و (هاوکار) بۆی.

(٥٤) ئیسماعیلیش باس بکە لە قورئاندا، بە راستی ئەو لە بەڵێن و پەیمانەکانیدا راستگۆ بوو، ئەو پێغەمبەرو رەوانە کراوی خوا بوو.

(٥٥) (ئیسماعیل) هەمیشەو بەردەوام، فەرمانی دەدا بە خێزانی و خزمانی، کە نوێژەکانیان (بە رێک و پێکی و لە کاتی خۆیدا) ئەنجام بدەن و زەکاتیش فەرامۆش نەکەن و ئەو لای پەروەردگاری شایستەی رێزو رەزامەندی بوو.

(٥٦) هەروەها لە قورئاندا باسی ئیدریس بکە، چونکە ئەویش پێغەمبەرێکی زۆر راستکارو راستگۆ بوو..

(٥٧) بۆیە رێزی زۆرمان لێگرت و پایەدارو بەرزو بڵندمان کرد لە جێگە و رێگەی تایبەتدا.

(٥٨) ئا ئەوانە کەسانێکن کە خوای گەورە نازو نیعمەتی بەسەردا رشتوون لە پێغەمبەران، لە نەوەی ئادەم و ئەوانەش (کە لە کەشتیەکەدا) لەگەڵ نوحدا سوارمان کردن و لە نەوەی ئیبراهیم و یەعقوب و لەوانەی کە هیدایەتمان داون و هەڵمان بژاردوون، ئەوانە، هەرکاتێک ئایەتەکانی خوای میهرەبانیان بەسەردا بخوێنرێتەوە، بە پەلە سوژدە دەبەن و ئەسرین لە دیدەیان دەبارێت، (لە سۆزو خۆشەویستی پەروەردگاریان دڵانی پڕ لە نوورو ئیمانیان دەکوڵێت) و دەگرین.

(٥٩) لە دوای ئەوان کەسانێک لە نەوەکانیان بوونە جێنشین، کە نوێژەکانیان بەزایە داو شوێنی ئارەزووەکانی نەفسیان کەوتن، ئەوانە تووشی گومڕای و سەرگەردانی و سزا دەبن (لە دنیاو قیامەتدا).

(٦٠) جگە لەوانەی کە تەوبە دەکەن و باوەڕی دامەزراو دەهێنن و کارو کردەوەی چاک ئەنجام دەدەن، ئا ئەوانە دەچنە بەهەشتەوە و هیچ جۆرە ستەمێکیان لێ ناکرێت.

(٦١) ئەو بەهەشتە پڕ لە باخە چڕانەی کە خوای میهرەبان بەڵێنی بە بەندەکانی داوە لە جیهانی شاراوەدا، بەڕاستی ئەو بەڵێنەی خوا، بەڕێوەیە و هەر دێتە دی.

(٦٢) ئەوسا لەوێ هیچ گوفتارێکی نابەجێ نابیستن، جگە لە سڵاو کردن و (گوفتاری خۆش و بەجێ) نەبێت، لە بەیانیان و ئێوارانیدا (لە هەموو کاتێکدا) رزق و رۆزی (خواردن و خواردنەوەی خۆش و بەتام) بۆیان ئامادەیە.

(٦٣) ئەو بەهەشت و شوێنە خۆشە، بەو بەندانەمان دەبەخشین و دەیانکەینە خاوەنی، کە خواناس و پارێزکارن.

(٦٤) (ماوەیەک وەحی وەستا، پێغەمبەرﷺ لە فریشتە جوبرەئیلی پرسی، خوای گەورەش لە قورئاندا وەڵامی دایەوە): ئێمە تەنها بەفەرمانی پەروەردگارت نەبێت دانابەزین، هەرچی داهاتوو رابوردوومان هەیەو ئەوەش لە نێوانیاندا هەیە، بۆ ئەو پەروەردگارەیە، وەنەبێت پەروەردگاری تۆ هیچ شتێک فەرامۆش بکات.

رَبُّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَمَا بَيْنَهُمَا فَٱعْبُدْهُ وَٱصْطَبِرْ لِعِبَٰدَتِهِۦ ۚ هَلْ تَعْلَمُ لَهُۥ سَمِيًّا ﴿٦٥﴾ وَيَقُولُ ٱلْإِنسَٰنُ أَءِذَا مَا مِتُّ لَسَوْفَ أُخْرَجُ حَيًّا ﴿٦٦﴾ أَوَلَا يَذْكُرُ ٱلْإِنسَٰنُ أَنَّا خَلَقْنَٰهُ مِن قَبْلُ وَلَمْ يَكُ شَيْـًٔا ﴿٦٧﴾ فَوَرَبِّكَ لَنَحْشُرَنَّهُمْ وَٱلشَّيَٰطِينَ ثُمَّ لَنُحْضِرَنَّهُمْ حَوْلَ جَهَنَّمَ جِثِيًّا ﴿٦٨﴾ ثُمَّ لَنَنزِعَنَّ مِن كُلِّ شِيعَةٍ أَيُّهُمْ أَشَدُّ عَلَى ٱلرَّحْمَٰنِ عِتِيًّا ﴿٦٩﴾ ثُمَّ لَنَحْنُ أَعْلَمُ بِٱلَّذِينَ هُمْ أَوْلَىٰ بِهَا صِلِيًّا ﴿٧٠﴾ وَإِن مِّنكُمْ إِلَّا وَارِدُهَا ۚ كَانَ عَلَىٰ رَبِّكَ حَتْمًا مَّقْضِيًّا ﴿٧١﴾ ثُمَّ نُنَجِّى ٱلَّذِينَ ٱتَّقَوا۟ وَّنَذَرُ ٱلظَّٰلِمِينَ فِيهَا جِثِيًّا ﴿٧٢﴾ وَإِذَا تُتْلَىٰ عَلَيْهِمْ ءَايَٰتُنَا بَيِّنَٰتٍ قَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ لِلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ أَىُّ ٱلْفَرِيقَيْنِ خَيْرٌ مَّقَامًا وَأَحْسَنُ نَدِيًّا ﴿٧٣﴾ وَكَمْ أَهْلَكْنَا قَبْلَهُم مِّن قَرْنٍ هُمْ أَحْسَنُ أَثَٰثًا وَرِءْيًا ﴿٧٤﴾ قُلْ مَن كَانَ فِى ٱلضَّلَٰلَةِ فَلْيَمْدُدْ لَهُ ٱلرَّحْمَٰنُ مَدًّا ۚ حَتَّىٰٓ إِذَا رَأَوْا۟ مَا يُوعَدُونَ إِمَّا ٱلْعَذَابَ وَإِمَّا ٱلسَّاعَةَ فَسَيَعْلَمُونَ مَنْ هُوَ شَرٌّ مَّكَانًا وَأَضْعَفُ جُندًا ﴿٧٥﴾ وَيَزِيدُ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ٱهْتَدَوْا۟ هُدًى ۗ وَٱلْبَٰقِيَٰتُ ٱلصَّٰلِحَٰتُ خَيْرٌ عِندَ رَبِّكَ ثَوَابًا وَخَيْرٌ مَّرَدًّا ﴿٧٦﴾

(٦٥) ئەو زاتە پەروەردگاری ئاسمانەکان و زەوی و هەموو دروستکراوانی نێوانیانە، کەواتە، هەر ئەو بپەرستە و زۆر بەردەوام و خۆگربە لە پەرستنیدا، ئایا کەس شک دەبەیت هاوناوی ئەو و هاوتای ئەو بێت؟ (خاوەنی سیفەتی بەرزو بڵندو پیرۆز بێت وەک ئەو؟!).

(٦٦) ئادەمیزادی (بێباوەڕ) دەڵێت: ئایا کاتێک مردم، جارێکی تر لە ئایندەدا زیندوو دەکرێمەوە؟!.

(٦٧) باشە ئاخر ئادەمیزاد بۆ ئەوە یاد ناکات بەڕاستی ئێمە پێشتر دروستمان کرد، هەر هیچ نەبوو؟

(٦٨) سوێند بە پەروەردگارت خوانەناسان و شەیتانەکان کۆ دەکەینەوە، پاشان هەموویان بە دەوری دۆزەخدا بەچۆکدا دەهێنین و (دەیانخەینە ناوی).

(٦٩) لەوەودوا لە هەر گرۆ و دەستەیەک، ئەوانە دەردەکێشین کە زۆر یاخی بوون لە خوای میهرەبان (دژایەتی دین و بەرنامەکەیان دەکرد).

(٧٠) پاشان زۆرچاک ئاگادارین بەوەی کەکێ لەوانە لە پێشترو شایستەترە بەوەی کە زوو بخرێتە ناو ئاگری دۆزەخەوە (تا ببرژێت تیایدا).

(٧١) ئێوە (خەڵکینە) کەستان نییە تێپەڕ نەکات بەسەر دۆزەخدا، (ئیمانداران بۆ ئەوەی زیاتر قەدری بەهەشت و رەحمەتی خوا بزانن، کافران بۆ ئەوەی بکەونە ناوی) ئەم پێشهاتە شتێکی بڕیاردراوە هەر جێبەجێ دەکرێت.

(٧٢) لەوەودوا ئەوانە رزگار دەکەین کە پارێزکارو خواناس بوون، ستەمکارانیش لەناو دۆزەخدا بەچۆکدا دەهێنین.

(٧٣) کاتێک ئایەتەکانی ئێمە بەسەر بێباوەڕاندا بە روونی و ئاشکرا بخوێنرێتەوە، ئەوانەی کە بێباوەڕ بوون بەوانە دەڵێن کە باوەڕیان هێناوە: باشە کام لەو دوو دەستەیە، جێگەو رێگەی خۆش و ژیانی پڕ عەیش و نۆشی بۆ لواوە!! (نەفامان پێوەریان ژیانی دنیای تەمەن کورتایە).

(٧٤) چەندەها قەوم و خەڵکی ئالەبارمان پێش ئەمان لەناوداوە، کەلوپەل و ناوماڵیان لەمان چاکتر بووە، سیماو قیافەشیان لەمان رێکو پێکتر بووە (کوان ؟... لە کوێن ؟... بۆ دیار نین ؟...).

(٧٥) (ئەی پێغەمبەرﷺ تۆ) بڵێ: ئەوەی لە گومڕاییدایە باهەرخوای میهرەبان تەمەنی درێژو ماڵ و سامان و دنیای پێ ببەخشێت (بەچی دەچێت، بۆ کوێی دەبات، ئەوپەڕی ئەوەیە) هەتا کاتێک ئەو هەڕەشانە دەبینن کەڵێیان دەکرێت، یان سزاو ئازاری دنیایە، یان بەرپابوونی قیامەتە، جا خوانەناسان لەئایندەدا دەزانن کێ جێگە و رێگەی ناخۆشەو کێ لەشکرو سەربازانی لاوازە.

(٧٦) (لەولاشەوە) ئەوانەی رێبازی هیدایەتیان گرتۆتەبەر خوا زیاتر هیدایەتیان دەدات، بەڵام دڵنیابن کردەوە چاکەکان کە بەرهەمیان دەمێنێتەوە پاداشتیان چاکترە لای پەروەردگارت باشترین سەرەنجامیشە.

أَفَرَءَيْتَ ٱلَّذِى كَفَرَ بِـَٔايَـٰتِنَا وَقَالَ لَأُوتَيَنَّ مَالًا وَوَلَدًا ﴿٧٧﴾ أَطَّلَعَ ٱلْغَيْبَ أَمِ ٱتَّخَذَ عِندَ ٱلرَّحْمَـٰنِ عَهْدًا ﴿٧٨﴾ كَلَّا ۚ سَنَكْتُبُ مَا يَقُولُ وَنَمُدُّ لَهُۥ مِنَ ٱلْعَذَابِ مَدًّا ﴿٧٩﴾ وَنَرِثُهُۥ مَا يَقُولُ وَيَأْتِينَا فَرْدًا ﴿٨٠﴾ وَٱتَّخَذُوا۟ مِن دُونِ ٱللَّهِ ءَالِهَةً لِّيَكُونُوا۟ لَهُمْ عِزًّا ﴿٨١﴾ كَلَّا ۚ سَيَكْفُرُونَ بِعِبَادَتِهِمْ وَيَكُونُونَ عَلَيْهِمْ ضِدًّا ﴿٨٢﴾ أَلَمْ تَرَ أَنَّآ أَرْسَلْنَا ٱلشَّيَـٰطِينَ عَلَى ٱلْكَـٰفِرِينَ تَؤُزُّهُمْ أَزًّا ﴿٨٣﴾ فَلَا تَعْجَلْ عَلَيْهِمْ ۖ إِنَّمَا نَعُدُّ لَهُمْ عَدًّا ﴿٨٤﴾ يَوْمَ نَحْشُرُ ٱلْمُتَّقِينَ إِلَى ٱلرَّحْمَـٰنِ وَفْدًا ﴿٨٥﴾ وَنَسُوقُ ٱلْمُجْرِمِينَ إِلَىٰ جَهَنَّمَ وِرْدًا ﴿٨٦﴾ لَّا يَمْلِكُونَ ٱلشَّفَـٰعَةَ إِلَّا مَنِ ٱتَّخَذَ عِندَ ٱلرَّحْمَـٰنِ عَهْدًا ﴿٨٧﴾ وَقَالُوا۟ ٱتَّخَذَ ٱلرَّحْمَـٰنُ وَلَدًا ﴿٨٨﴾ لَّقَدْ جِئْتُمْ شَيْـًٔا إِدًّا ﴿٨٩﴾ تَكَادُ ٱلسَّمَـٰوَٰتُ يَنفَطِرْنَ مِنْهُ وَتَنشَقُّ ٱلْأَرْضُ وَتَخِرُّ ٱلْجِبَالُ هَدًّا ﴿٩٠﴾ أَن دَعَوْا۟ لِلرَّحْمَـٰنِ وَلَدًا ﴿٩١﴾ وَمَا يَنۢبَغِى لِلرَّحْمَـٰنِ أَن يَتَّخِذَ وَلَدًا ﴿٩٢﴾ إِن كُلُّ مَن فِى ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ إِلَّآ ءَاتِى ٱلرَّحْمَـٰنِ عَبْدًا ﴿٩٣﴾ لَّقَدْ أَحْصَىٰهُمْ وَعَدَّهُمْ عَدًّا ﴿٩٤﴾ وَكُلُّهُمْ ءَاتِيهِ يَوْمَ ٱلْقِيَـٰمَةِ فَرْدًا ﴿٩٥﴾

(٧٧) ئایا ئەو جۆرە کەسانەت بینیوە، کە باوەڕی بەئایەت و فەرمانەکانی ئێمە نیەو دەڵێت: سوێند بە خوا من سامان و کوڕو نەوەم پێ دەدرێت!

(٧٨) باشە، ئاخۆ (ئەو بەندە یاخیە) بەنهێنی و شاراوەکانی زانیووە، یاخود بەڵێنی وەرگرتووە لە خوای میهرەبان (کە دنیا بە دڵی ئەو بێت؟!).

(٧٩) نەخێر، وانی‌یە (بەدڵی ئەو نابێت) ئەوەی کە دەیڵێت لە ئاییندەدا تۆماری دەکەین لەسەری و سزای دوور و درێژی بۆ ساز دەکەین.

(٨٠) بێگومان ئەوەی ئەو دەیڵێت: بەمیراتی لێی دەسێنینەوە، بەتەنهاش دێتە لامان (بۆ لێپرسینەوە).

(٨١) ئەو بێباوەڕانە لەجیاتی خوا جۆرەها شتی تریان کردۆتە خوای خۆیان تا پایەداری و دەسەلاتیان (بەخەیاڵی خۆیان) دەست بکەوێت.

(٨٢) نەخێر، وانی‌یە (خەیاڵیان خاوە)، ئەو شتانەی ئەوان دەیپەرستن، (لە ڕۆژی قیامەتدا) باوەڕیان بەپەرستنی ئەوان نیە و نارەزایی دەردەبڕن، (بەڵکو بە سەختی) دژایەتیان دەکەن و بەرپەرچیان دەدەنەوە.

(٨٣) ئایا نابینیت بەڕاستی ئێمە چۆن شەیتانەکان دەنێرینە سەر خوانەناسان، بەگەرمی هانیان دەدەن بۆ تاوان و گوناهو خراپە.

(٨٤) (ئەی پێغەمبەرﷺ) پەلەیان لێ مەکە، چونکە بێگومان ئێمە بەوردی هەر هەموو کارو کردەوەیان بەژمارە تۆمار دەکەین.

(٨٥) ڕۆژێک دێت ئێمە دەستە دەستە خواناس و پارێزکاران بۆ لای خوای میهرەبان بە ڕێ دەکەین (تا بەدیداری شادببن و بیانخاتە بەهەشتەوە).

(٨٦) تاوانبارو گوناهکارانیش بەپەلەو بەتینویەتی ڕابێچ دەکەین بۆ ناو دۆزەخ.

(٨٧) ئەوانە خاوەنی تکا نین و کەس تکایان بۆ ناکات، مەگەر ئەو کەسەی کە لەکاتی خۆیدا خوای میهرەبان بەڵێنی پێداوە کە تکا بکات یان تکای بۆ بکرێت.

(٨٨) (جوولەکە و گاورو بت پەرستان) دەیانوت: خوای میهرەبان ڕۆڵە و نەوەی بۆ خۆی داناوە!!

(٨٩) سوێند بەخوا بەڕاستی بوختانێکی ناقۆڵاو دەکەن و گوفتارێکی ناشایستە و سەرسوڕهێنەر دەڵێن.

(٩٠) خەریکە ئاسمانەکان لە ناقۆڵایی ئەو گوفتارە نابەجێیە، لەت و پەت ببێت، زەوی خەریکە شەق بەرێت و ڕۆبچێت، کێوەکانیش خەریکە بکەون و ورد و خاش ببن.

(٩١) کاتێک کە نەفامان بوونی ڕۆڵە و نەوەیان دایە پاڵ خوای میهرەبان.

(٩٢) لەکاتێکدا بۆ خوای میهرەبان نەهاتووە و ڕەوا نیە کە نەوە بۆ خۆی بڕیار بدات.

(٩٣) هیچ کەسێک نی‌یە لە ئاسمانەکان و زەویدا، کە بەندەی ملکەچی خوای میهرەبان نەبێت.

(٩٤) سوێند بەخوا بێگومان هەر هەموویانی سەرژمێر کردووە و یەک یەک ژمارەی کردوون (کەسی لێ ون نابێت)، هەر هەموویان ڕۆژی قیامەت دێنە پێشەوە بۆ لای بە تاک و تەنها (بێ پاسەوان و بێ کەس).

(٩٥) یەکە یەکەی ئەوخەڵکە بە تاک و تەنهای دێت ئامادە دەکرێت لەبەردەم دادگای پڕ لە دادوەری خوادا.

إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ سَيَجۡعَلُ لَهُمُ ٱلرَّحۡمَٰنُ وُدّٗا ﴿٩٦﴾ فَإِنَّمَا يَسَّرۡنَٰهُ بِلِسَانِكَ لِتُبَشِّرَ بِهِ ٱلۡمُتَّقِينَ وَتُنذِرَ بِهِۦ قَوۡمٗا لُّدّٗا ﴿٩٧﴾ وَكَمۡ أَهۡلَكۡنَا قَبۡلَهُم مِّن قَرۡنٍ هَلۡ تُحِسُّ مِنۡهُم مِّنۡ أَحَدٍ أَوۡ تَسۡمَعُ لَهُمۡ رِكۡزَۢا ﴿٩٨﴾

## سُورَةُ طه

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

طه ﴿١﴾ مَآ أَنزَلۡنَا عَلَيۡكَ ٱلۡقُرۡءَانَ لِتَشۡقَىٰٓ ﴿٢﴾ إِلَّا تَذۡكِرَةٗ لِّمَن يَخۡشَىٰ ﴿٣﴾ تَنزِيلٗا مِّمَّنۡ خَلَقَ ٱلۡأَرۡضَ وَٱلسَّمَٰوَٰتِ ٱلۡعُلَى ﴿٤﴾ ٱلرَّحۡمَٰنُ عَلَى ٱلۡعَرۡشِ ٱسۡتَوَىٰ ﴿٥﴾ لَهُۥ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلۡأَرۡضِ وَمَا بَيۡنَهُمَا وَمَا تَحۡتَ ٱلثَّرَىٰ ﴿٦﴾ وَإِن تَجۡهَرۡ بِٱلۡقَوۡلِ فَإِنَّهُۥ يَعۡلَمُ ٱلسِّرَّ وَأَخۡفَى ﴿٧﴾ ٱللَّهُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَۖ لَهُ ٱلۡأَسۡمَآءُ ٱلۡحُسۡنَىٰ ﴿٨﴾ وَهَلۡ أَتَىٰكَ حَدِيثُ مُوسَىٰٓ ﴿٩﴾ إِذۡ رَءَا نَارٗا فَقَالَ لِأَهۡلِهِ ٱمۡكُثُوٓاْ إِنِّيٓ ءَانَسۡتُ نَارٗا لَّعَلِّيٓ ءَاتِيكُم مِّنۡهَا بِقَبَسٍ أَوۡ أَجِدُ عَلَى ٱلنَّارِ هُدٗى ﴿١٠﴾ فَلَمَّآ أَتَىٰهَا نُودِيَ يَٰمُوسَىٰٓ ﴿١١﴾ إِنِّيٓ أَنَا۠ رَبُّكَ فَٱخۡلَعۡ نَعۡلَيۡكَ إِنَّكَ بِٱلۡوَادِ ٱلۡمُقَدَّسِ طُوٗى ﴿١٢﴾

(٩٦) بەڕاستی ئەوانەی کە باوەڕیان هێناوە و کارو کردەوە چاکەکانیان ئەنجامداوە، لە ئایندەدا خوای میهرەبان سۆزو خۆشەویستی و ڕێزی (تایبەتیان) بۆ ئامادە دەکات، (هەروەها لە لایەن فریشتەکان و ئیمانداران و نیشتەجێکانی بەهەشتەوە) خۆشەویست و ڕێزدارن.

(٩٧) جا بێگومان ئێمە ئەم قورئانەمان ئاسان کردووە و هەر بەزمانی تۆ ڕەوانەمان کردووە، بۆ ئەوەی مژدەی پێ بدەیت بەپارێزکارو خواناسەکان، هەروەها کەسانی سەرسەخت و کەللەڕەقی پێ بترسێنیت.

(٩٨) ئێمە چەندەها قەوم و خەڵکی نالەبارمان پێش ئەمان لەناوبردووە، ئایا هەست دەکەیت کە یەکێ لەوانە مابێت، یان سرتەیەک، چرپەیەک، مشەیەکیان، لێوە بێت؟!

سورەتی (طـــه)

بەناوی خوای بەخشندە و میهرەبان

(١) سەرنجی سەرەتای سوورەتی (البقرة) بدە.

(٢) ئەی پێغەمبەر ﷺ ئێمە ئەو قورئانەمان دانەبەزاندووە بۆ سەر تۆ تاتووشی خەفەت و غەم و پەژارە ببیت.

(٣) بەڵکو یادخەرەوەیە، بۆ ئەو کەسەی کە لە لێپرسینەوەی پەروەردگار دەترسێت.

(٤) قورئان، لەلایەن زاتێکەوە بەش بەش دابەزیووە، کە زەوی دروست کردووە و ئاسمانە بڵندەکانی بەدی هێناوە.

(٥) خوای میهرەبان بەسەر تەختی فەرمانڕەوایەتی خۆیەوە وەستاوە (عەرشی ئەو زاتە لە سەرو حەوت چین ئاسمانەوەیە و لەوێوە سەرپەرشتی هەموو بەدیهێنراوەکان دەکات، سەرنجی لاپەرە ٢٤٩ ئایەتی ژمارە/٢ الرعد).

(٦) هەرچی لە ئاسمانەکان و هەرچی لە زەویداو هەرچی لە نێوانیاندا هەیە و هەرچی لە ژێرخاکدایە (هەر هەمووی) خوا خاوەنیانە.

(٧) خۆ ئەگەر بەئاشکرا قسە بکەیت، ئەوە بێگومان ئەو زاتە بەنهێنی و لە نهێنیش پەنهانتر دەزانێت.

(٨) ﷲ زاتێکە کە جگە لەو خوایەکی تر نیە، هەرچی ناوە پیرۆزو سیفاتە جوانەکان هەیە هەر شایستەی ئەوە.

(٩) ئەی پێغەمبەر ﷺ ئایا هەواڵی بەسەرهاتی موسات پێگەیشتووە؟!

(١٠) کاتێک ئاگرێکی بینی (لە گەڕانەوەیدا بۆ میسر، لە شەوێکی ساردا، لە بیابانی سینادا) بەخێزانەکەی وت: ئێوە لێرە بن، بەڕاستی من ئاگرێکم بەدی کردووە، (با بڕۆم) بەڵکو سەلکە بزوتێکتان بۆ بهێنم، یان کەسێکم دەست بکەوێت ڕێنموویم بکات.

(١١) جا کاتێک نزیکی ئاگرەکە بۆوە، بانگی لێکرا: ئەی موسا ...

(١٢) دڵنیابە من پەروەردگاری تۆم، کەواتە پێڵاوەکانت دا بکەنە، چونکە بێگومان تۆ لە دۆڵی پیرۆزی ـطوی ـ دایت.

وَأَنَا ٱخۡتَرۡتُكَ فَٱسۡتَمِعۡ لِمَا يُوحَىٰٓ ﴿١٣﴾ إِنَّنِيٓ أَنَا ٱللَّهُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّآ أَنَا۠
فَٱعۡبُدۡنِي وَأَقِمِ ٱلصَّلَوٰةَ لِذِكۡرِيٓ ﴿١٤﴾ إِنَّ ٱلسَّاعَةَ ءَاتِيَةٌ
أَكَادُ أُخۡفِيهَا لِتُجۡزَىٰ كُلُّ نَفۡسِۭ بِمَا تَسۡعَىٰ ﴿١٥﴾ فَلَا يَصُدَّنَّكَ
عَنۡهَا مَن لَّا يُؤۡمِنُ بِهَا وَٱتَّبَعَ هَوَىٰهُ فَتَرۡدَىٰ ﴿١٦﴾ وَمَا تِلۡكَ
بِيَمِينِكَ يَٰمُوسَىٰ ﴿١٧﴾ قَالَ هِيَ عَصَايَ أَتَوَكَّؤُاْ عَلَيۡهَا
وَأَهُشُّ بِهَا عَلَىٰ غَنَمِي وَلِيَ فِيهَا مَـَٔارِبُ أُخۡرَىٰ ﴿١٨﴾ قَالَ أَلۡقِهَا
يَٰمُوسَىٰ ﴿١٩﴾ فَأَلۡقَىٰهَا فَإِذَا هِيَ حَيَّةٞ تَسۡعَىٰ ﴿٢٠﴾ قَالَ خُذۡهَا
وَلَا تَخَفۡۖ سَنُعِيدُهَا سِيرَتَهَا ٱلۡأُولَىٰ ﴿٢١﴾ وَٱضۡمُمۡ يَدَكَ
إِلَىٰ جَنَاحِكَ تَخۡرُجۡ بَيۡضَآءَ مِنۡ غَيۡرِ سُوٓءٍ ءَايَةً أُخۡرَىٰ ﴿٢٢﴾ لِنُرِيَكَ
مِنۡ ءَايَٰتِنَا ٱلۡكُبۡرَى ﴿٢٣﴾ ٱذۡهَبۡ إِلَىٰ فِرۡعَوۡنَ إِنَّهُۥ طَغَىٰ ﴿٢٤﴾ قَالَ
رَبِّ ٱشۡرَحۡ لِي صَدۡرِي ﴿٢٥﴾ وَيَسِّرۡ لِيٓ أَمۡرِي ﴿٢٦﴾ وَٱحۡلُلۡ عُقۡدَةٗ مِّن
لِّسَانِي ﴿٢٧﴾ يَفۡقَهُواْ قَوۡلِي ﴿٢٨﴾ وَٱجۡعَل لِّي وَزِيرٗا مِّنۡ أَهۡلِي ﴿٢٩﴾ هَٰرُونَ
أَخِي ﴿٣٠﴾ ٱشۡدُدۡ بِهِۦٓ أَزۡرِي ﴿٣١﴾ وَأَشۡرِكۡهُ فِيٓ أَمۡرِي ﴿٣٢﴾ كَيۡ نُسَبِّحَكَ
كَثِيرٗا ﴿٣٣﴾ وَنَذۡكُرَكَ كَثِيرًا ﴿٣٤﴾ إِنَّكَ كُنتَ بِنَا بَصِيرٗا ﴿٣٥﴾ قَالَ قَدۡ
أُوتِيتَ سُؤۡلَكَ يَٰمُوسَىٰ ﴿٣٦﴾ وَلَقَدۡ مَنَنَّا عَلَيۡكَ مَرَّةً أُخۡرَىٰٓ ﴿٣٧﴾

(١٣) منیش هەڵم بژاردوویت (بۆ رابەرایەتی و پێغەمبەرایەتی) جا گوێ بگرە بۆ ئەو شتانەی لە رێگەی وەحی و نیگاوە پێت رادەگەیەنرێت.

(١٤) بەڕاستی هەر من (الله)م، من خوام، هیچ خوایەک نیە جگە لە من، کەواتە هەر من بپەرستە و نوێژەکانیشت بەچاکی ئەنجام بدە، تا هەمیشە منت لە یاد بێت.

(١٥) بێگومان رۆژی قیامەت بەڕێوەیە و هەر دێت، نزیکە بیشارمەوە، بۆ ئەوەی هەموو کەسێک بە گوێرەی کارو کردەوە و هەوڵ و کۆششی پاداشت بدرێتەوە.

(١٦) (ئەی موسا)؛ نەیەڵێت ئەو کەسانەی کە باوەڕیان بەقیامەت نیە و شوێنی ئارەزووی خۆیان کەوتوون، (لەو راستیە) وێڵت بکەن، چونکە ئەوسا تیادەچیت و زەرەر دەکەیت.

(١٧) (ئینجا خوای گەورە پرسی) ئەی موسا: ئەی ئەوە چیە، بەدەستی راستەوە (گرتووتە).

(١٨) موسا وتی: ئەوە گۆچانەکەمە، خۆمی بەسەردا دەدەم و(دەیمالم بەدرەختدا) تا گەڵا بوەرێنم بۆ مەڕەکانم، چەند مەبەستێکی تریشم تێیدا هەیە.

(١٩) خوا فەرمووی: دە فڕێی بدە ئەی موسا.

(٢٠) جا هەر کە فڕێی دا، یەکسەر بوو بە مارێکی زیندوو، بەخێرایی دەجولایەوە.

(٢١) خوا فەرمووی: بیگرە و مەترسە، وەک ئەوسای خۆی لێدەکەینەوە.

(٢٢) دەستیشت بخەرە ژێر باڵتەوە، ئەو کاتە بە رەنگی سپی و درەوشاوەیی دێتە دەرەوە، بێ ئەوەی عەیبدار ببێت، ئەوەش نیشانە و بەڵگەیەکی ترە.

(٢٣) (ئەم شتانە بۆ ئەوەیە) تا هەندێک لە موعجیزە گەورەکانی خۆمانت نیشان بدەین.

(٢٤) دە بچۆ بۆ لای فیرعەون چونکە بێگومان یاخیە و لە سنوور دەرچووە.

(٢٥) (موسا کەوتە نزا کردن) وتی: پەروەردگارا سینە و دڵ و دەروونم ئاسوودە و گوشاد بکە.

(٢٦) ئیش و کارو هەوڵ و کۆششم بۆ ئاسان بکە.

(٢٧) گرێی زمانم بکەرەوە و زمانم گویا و پاراو بکە.

(٢٨) تا لە قسەو گوفتارو مەرامم تێبگەن.

(٢٩) لە کەس و کاریشم هاوکار و یارمەتیدەرێکم بۆ بڕیار بدە.

(٣٠) (حەز دەکەم) هاروونی برام بێت.

(٣١) خوایە پشتمی پێ بەهێز بکە.

(٣٢) بیکە هاوبەش و یاریدەدەرم، لەگەیاندنی (پەیامەکەتدا).

(٣٣) تا تەسبیحات و ستایشی تۆ زۆر بکەین.

(٣٤) زۆر یادی تۆش بکەین و ناوی تۆ بەرین.

(٣٥) چونکە بەڕاستی تۆ هەمیشە بینای بە حاڵی ئێمە، بە هەڵس و کەوتی ئێمە، بە هەموو شتێکی ئێمە.

(٣٦) (خوای گەورەش) فەرمووی: ئەی موسا هەموو داخوازیەکانت بەجێ یە و پەسەندە و هەموویانت پێدرا.

(٣٧) سوێند بەخوا بێگومان ئێمە جارێکی تریش منەتمان ناوەتە سەر تۆو لای رەحمەتمان لێکردوویتەوە ...

إِذْ أَوْحَيْنَآ إِلَىٰٓ أُمِّكَ مَا يُوحَىٰٓ ﴿٣٨﴾ أَنِ ٱقْذِفِيهِ فِى ٱلتَّابُوتِ فَٱقْذِفِيهِ
فِى ٱلْيَمِّ فَلْيُلْقِهِ ٱلْيَمُّ بِٱلسَّاحِلِ يَأْخُذْهُ عَدُوٌّ لِّى وَعَدُوٌّ لَّهُۥ ۚ وَأَلْقَيْتُ
عَلَيْكَ مَحَبَّةً مِّنِّى وَلِتُصْنَعَ عَلَىٰ عَيْنِىٓ ﴿٣٩﴾ إِذْ تَمْشِىٓ أُخْتُكَ
فَتَقُولُ هَلْ أَدُلُّكُمْ عَلَىٰ مَن يَكْفُلُهُۥ ۖ فَرَجَعْنَٰكَ إِلَىٰٓ أُمِّكَ كَىْ تَقَرَّ
عَيْنُهَا وَلَا تَحْزَنَ ۚ وَقَتَلْتَ نَفْسًا فَنَجَّيْنَٰكَ مِنَ ٱلْغَمِّ وَفَتَنَّٰكَ فُتُونًا ۚ
فَلَبِثْتَ سِنِينَ فِىٓ أَهْلِ مَدْيَنَ ثُمَّ جِئْتَ عَلَىٰ قَدَرٍ يَٰمُوسَىٰ ﴿٤٠﴾
وَٱصْطَنَعْتُكَ لِنَفْسِى ﴿٤١﴾ ٱذْهَبْ أَنتَ وَأَخُوكَ بِـَٔايَٰتِى وَلَا تَنِيَا
فِى ذِكْرِى ﴿٤٢﴾ ٱذْهَبَآ إِلَىٰ فِرْعَوْنَ إِنَّهُۥ طَغَىٰ ﴿٤٣﴾ فَقُولَا لَهُۥ قَوْلًا لَّيِّنًا
لَّعَلَّهُۥ يَتَذَكَّرُ أَوْ يَخْشَىٰ ﴿٤٤﴾ قَالَا رَبَّنَآ إِنَّنَا نَخَافُ أَن يَفْرُطَ عَلَيْنَآ
أَوْ أَن يَطْغَىٰ ﴿٤٥﴾ قَالَ لَا تَخَافَآ ۖ إِنَّنِى مَعَكُمَآ أَسْمَعُ وَأَرَىٰ
﴿٤٦﴾ فَأْتِيَاهُ فَقُولَآ إِنَّا رَسُولَا رَبِّكَ فَأَرْسِلْ مَعَنَا بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ
وَلَا تُعَذِّبْهُمْ ۖ قَدْ جِئْنَٰكَ بِـَٔايَةٍ مِّن رَّبِّكَ ۖ وَٱلسَّلَٰمُ عَلَىٰ مَنِ ٱتَّبَعَ
ٱلْهُدَىٰٓ ﴿٤٧﴾ إِنَّا قَدْ أُوحِىَ إِلَيْنَآ أَنَّ ٱلْعَذَابَ عَلَىٰ مَن كَذَّبَ
وَتَوَلَّىٰ ﴿٤٨﴾ قَالَ فَمَن رَّبُّكُمَا يَٰمُوسَىٰ ﴿٤٩﴾ قَالَ رَبُّنَا ٱلَّذِىٓ أَعْطَىٰ
كُلَّ شَىْءٍ خَلْقَهُۥ ثُمَّ هَدَىٰ ﴿٥٠﴾ قَالَ فَمَا بَالُ ٱلْقُرُونِ ٱلْأُولَىٰ ﴿٥١﴾

(٣٨) کاتێک ئێمە ئەوەی پێویست بوو بەدایکت رابگەیەنرێت، پێمان گەیاند...

(٣٩) کە بیخەرە ناو تابوتێکی تایبەتەوە، ئینجا بیخەرە دەریاوە، با دەریا بەرەو کەنار بیبات، تا سەرەنجام دوژمنەکەی من و دوژمنەکەی ئەو بیگرێتەوە، خۆشەویستیم رژاند بەسەرتدا، تا لە ژێر چاودێری مندا گەورە ببیت.

(٤٠) (لەبیرت نەچێت) کاتێک خوشکەکەت دەڕۆیشت و چاودێری تۆی دەکرد، (لە نزیکی کۆشکی فیرعەونەوە، بینی گیریان خواردووە بە دەستەوە) وتی: باشە، ئایا کەسێکتان پێ بڵێم تا بۆتان بەخێو بکات، ئەوسا تۆمان گەڕاندەوە بۆ لای دایکت، تا چاوی روون بێت و خەفەت نەخوات، (ئەوەبوو کە گەورە بوویت بەهەڵە) کەسێکت کوشت، ئینجا ئێمە رزگارمان کردیت لە غەم و پەژارە، بە جۆرەها شێوە تۆمان تاقی کردۆتەوە، ئیتر ئەوەبوو ساڵەها لەناو خەڵکی مەدیەندا مایتەوە، (بەشوانکاری ژیانی خۆتت بردە سەر) ئینجا ئەی موسا لەکاتی دیاری کراودا هاتوویت (تا پەیامی ئێمە وەربگریت و رای بگەیەنیت)...

(٤١) (جا چاک بزانە) من تۆم دروست کردووە بۆ خۆم، (تا پەیامی من رابگەیەنیت).

(٤٢) دەی بڕۆ خۆت و براکەت هاوڕێ لەگەڵ موعجیزەکانمدا، نەکەن لەگەیاندنی پەیامی مندا سستی و خاوی بکەن.

(٤٣) هەردووکتان بچن بۆ لای فیرعەون، چونکە بەڕاستی ئەو لە سنوور دەرچووە و لە سەرزی بەندایەتی ترازاوە...

(٤٤) هەردووکتان بەنەرمی و بەجوانی گفتوگۆی لەگەڵدا بکەن، بۆ ئەوەی یاداوەری وەربگرێت، یان ترسی (سزای ئێمە) لە دەروونیدا جێ بگرێت.

(٤٥) موساو هاروون وتیان: پەروەردگارا! ئێمە بەڕاستی دەترسین پەلامارمان بدات و لەناومان بەرێت (پێش ئەوەی پەیامەکەتی پێ رابگەیەنین)، یان زیاتر سەرکەشیی بکات.

(٤٦) خوای گەورە فەرمووی: مەترسن من بەڕاستی لەگەڵتاندام، دەبیستم و دەبینم (نایەڵم دەستدرێژی بکاتە سەرتان).

(٤٧) ئینجا بچن بۆ لای و پێی بڵێن: ئێمە هەردووکمان لەلایەن پەروەردگاری تۆوە رەوانە کراوین (باوەڕی پێ بهێنە)و ئەوەی ئیسرائیلیش ئازاد بکە، با لەگەڵماندا بن، سزاو ئازاریان مەدە، بەڕاستی ئێمە، هاوڕێ لەگەڵ موعجیزەی تایبەتی لە لایەن پەروەردگارتەوە رەوانەکراوین، سڵاویش لەسەر ئەو کەسانە بێت کە شوێنی هیدایەت و رێبازی راستەقینە کەوتوون.

(٤٨) بێگومان ئێمە ئاگادارکراوین، کە سزاو ئازارو بەڵا لەسەر ئەوانەیە کە راستیەکان بە درۆ دەزانن و پشتی تێ دەکەن لێی یاخی دەبن.

(٤٩) فیرعەون بە فیزەوە وتی: باشە ئەی موسا پەروەردگاری ئێوە کێیە؟!

(٥٠) موسا وتی: پەروەردگارمان ئەو زاتەیە کە هەموو شتێکی بەتایبەتی و رێکو پێکی دروست کردووە، پاشان رێنموویی کردووە، تا بەچاکی دەوری خۆی ببینێت و (لەخزمەتی ئادەمیزادا بێت).

(٥١) فیرعەون وتی: ئەی ئەو هەموو خەڵکەی کە لەوەو پێش تیاچوون، چیان لێهات و سەرئەنجامیان چۆنە؟!

قَالَ عِلْمُهَا عِندَ رَبِّي فِي كِتَٰبٖۖ لَّا يَضِلُّ رَبِّي وَلَا يَنسَى ﴿٥٢﴾ ٱلَّذِي جَعَلَ لَكُمُ ٱلۡأَرۡضَ مَهۡدٗا وَسَلَكَ لَكُمۡ فِيهَا سُبُلٗا وَأَنزَلَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءٗ فَأَخۡرَجۡنَا بِهِۦٓ أَزۡوَٰجٗا مِّن نَّبَاتٖ شَتَّىٰ ﴿٥٣﴾ كُلُواْ وَٱرۡعَوۡاْ أَنۡعَٰمَكُمۡۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَٰتٖ لِّأُوْلِي ٱلنُّهَىٰ ﴿٥٤﴾ ۞مِنۡهَا خَلَقۡنَٰكُمۡ وَفِيهَا نُعِيدُكُمۡ وَمِنۡهَا نُخۡرِجُكُمۡ تَارَةً أُخۡرَىٰ ﴿٥٥﴾ وَلَقَدۡ أَرَيۡنَٰهُ ءَايَٰتِنَا كُلَّهَا فَكَذَّبَ وَأَبَىٰ ﴿٥٦﴾ قَالَ أَجِئۡتَنَا لِتُخۡرِجَنَا مِنۡ أَرۡضِنَا بِسِحۡرِكَ يَٰمُوسَىٰ ﴿٥٧﴾ فَلَنَأۡتِيَنَّكَ بِسِحۡرٖ مِّثۡلِهِۦ فَٱجۡعَلۡ بَيۡنَنَا وَبَيۡنَكَ مَوۡعِدٗا لَّا نُخۡلِفُهُۥ نَحۡنُ وَلَآ أَنتَ مَكَانٗا سُوٗى ﴿٥٨﴾ قَالَ مَوۡعِدُكُمۡ يَوۡمُ ٱلزِّينَةِ وَأَن يُحۡشَرَ ٱلنَّاسُ ضُحٗى ﴿٥٩﴾ فَتَوَلَّىٰ فِرۡعَوۡنُ فَجَمَعَ كَيۡدَهُۥ ثُمَّ أَتَىٰ ﴿٦٠﴾ قَالَ لَهُم مُّوسَىٰ وَيۡلَكُمۡ لَا تَفۡتَرُواْ عَلَى ٱللَّهِ كَذِبٗا فَيُسۡحِتَكُم بِعَذَابٖۖ وَقَدۡ خَابَ مَنِ ٱفۡتَرَىٰ ﴿٦١﴾ فَتَنَٰزَعُوٓاْ أَمۡرَهُم بَيۡنَهُمۡ وَأَسَرُّواْ ٱلنَّجۡوَىٰ ﴿٦٢﴾ قَالُوٓاْ إِنۡ هَٰذَٰنِ لَسَٰحِرَٰنِ يُرِيدَانِ أَن يُخۡرِجَاكُم مِّنۡ أَرۡضِكُم بِسِحۡرِهِمَا وَيَذۡهَبَا بِطَرِيقَتِكُمُ ٱلۡمُثۡلَىٰ ﴿٦٣﴾ فَأَجۡمِعُواْ كَيۡدَكُمۡ ثُمَّ ٱئۡتُواْ صَفّٗاۚ وَقَدۡ أَفۡلَحَ ٱلۡيَوۡمَ مَنِ ٱسۡتَعۡلَىٰ ﴿٦٤﴾



(٥٢) موسا وتی: زانیاری ئەوانە، لای پەروەردگارمەو لە دۆسیەکانی (لوح المحفوظ) دا پارێزراوە، پەروەردگاری من، هیچی لیٚ ون نابێت، هیچ شتێکیش فەرامۆش ناکات.

(٥٣) ئەو زاتەی کە زەوی بۆ ئێوە بار هێناوە، وەکو لانکە و بێشکە (لەسەری دەحەوێنەوە)، هەروەها جۆرەها ڕێگەی (زەمینی و ئاسمانی و هەوایی) تیایدا بۆ فەراهەم هێناون، لە ئاسمانیشەوە باران دادەبەزێنێت، کە بەهۆیەوە چەندەها جووت ڕووەکی پیٚ ڕواندووە.

(٥٤) خەڵکینە بخۆن (لەو بەرهەم و بەرەکەتە)، ماڵاتەکانیشتان بلەوەڕێنن، بەڕاستی ئا لەو شتانەدا بەڵگەونیشانەی زۆر هەیە بۆ کەسانی ژیرو هۆشمەند.

(٥٥) ئێمە ئێوەمان هەر لەم زەویە دروست کردووە، (دوای ماوەیەک) دەتانخەینەوە ناوی، پاشان جارێکی تر دووبارە لەو زەویە دەرتان دەهێنینەوە (بۆ لێپرسینەوە و وەرگرتنی ئەو پاداشتەی کە شایستەن).

(٥٦) سوێند بە خوا بەڕاستی هەرچی بەڵگە و موعجیزە هەبوو نیشانی فیرعەونماندا کەچی هەر هەمووی بەدرۆزانی و ئامادە نەبوو باوەڕ بهێنێت، بەڵکو هەر سەری باداو یاخی بوو.

(٥٧) فیرعەون (بە نارەزاییەوە) وتی: ئەی موسا هاتووی بۆ لامان، تا لەسەر زەوی خۆمان بە دەرکردنمان بدەیت و ئاوارەمان بکەیت، بەهۆی جادووگەریەکەتەوە؟!

(٥٨) کەواتە سوێند بێت ئێمەش جادوویەکت بۆ دەهێنین وەک ئەوەی خۆت، جا شوێن و کاتێک بۆ ئێمەو بۆ خۆت دابنیٚ، نە ئێمە سەرپێچی لیٚ بکەین نە تۆش، تا لە یەک شوێن و کاتدا دەستبەکار ببین لە شوێنێکی ڕێک و پێکدا.

(٥٩) موسا وتی: کاتی دیاریکراومان ڕۆژی ڕازاندنەوە بێت و لەکاتی چێشتەنگاودا خەڵکی کۆبکرێتەوە.

(٦٠) فیرعەون ئەو دانیشتنەی بەجیٚ هێشت و هەرچی فێڵ و تەڵەکەی هەبوو خستیەکارو پاشان (لەکاتی دیاری کراودا) هات (بە لەخۆبایی بوونەوە).

(٦١) موسا بە جادووگەرانی وت: هاوار لە ئێوە، نەکەن درۆ بەناوی خواوە هەڵبەستن، (هاوەڵی بۆ بڕیار بدەن، باوەڕ بە پێغەمبەرانی نەکەن) چونکە ئەو زاتە بەتوانایە بەبەڵایەک هەمووتان لەناو ببات و بتانفەوتێنێت، چونکە بەڕاستی ئەو کەسەی کە شتی نارەوای هەڵبەستووە و پروپاگەندەی درۆی کردووە نائومێد و بیٚ هیواو ڕەنجەڕۆ بووە.

(٦٢) (گوفتاری موسا کاری تێکردن) کەوتنە باس و خواس لە نێوان خۆیاندا و بەنهێنی چپ و هوڕیان دەست پیٚکرد.

(٦٣) (هەندێک لە دارو دەستەی فیرعەون) وتیان بە (جادووگەران) بەڕاستی ئەم دوانە، دوو جادووگەرن و دەیانەوێت، لە وڵات و نیشتمانی خۆتان دەرتانپەڕێنن بەهۆی جادووەکەیانەوە و ئەم ڕێگەو بەرنامە گرنگ و بەرزەی ئێوە لەناو بەرن...

(٦٤) جا هەرچی تواناو دەسەلات و جادوویەکتان هەیە بیخەنەکارو یەک پارچە و یەک دەست، دەستبەکار بن، بێگومان ئەوەی ئەمڕۆ دەیباتەوە سەرفرازو سەرکەوتوو بەهرەمەندە!!

قَالُوا۟ يَٰمُوسَىٰٓ إِمَّآ أَن تُلْقِىَ وَإِمَّآ أَن نَّكُونَ أَوَّلَ مَنْ أَلْقَىٰ ﴿٦٥﴾ قَالَ بَلْ أَلْقُوا۟ ۖ فَإِذَا حِبَالُهُمْ وَعِصِيُّهُمْ يُخَيَّلُ إِلَيْهِ مِن سِحْرِهِمْ أَنَّهَا تَسْعَىٰ ﴿٦٦﴾ فَأَوْجَسَ فِى نَفْسِهِۦ خِيفَةً مُّوسَىٰ ﴿٦٧﴾ قُلْنَا لَا تَخَفْ إِنَّكَ أَنتَ ٱلْأَعْلَىٰ ﴿٦٨﴾ وَأَلْقِ مَا فِى يَمِينِكَ تَلْقَفْ مَا صَنَعُوٓا۟ ۖ إِنَّمَا صَنَعُوا۟ كَيْدُ سَٰحِرٍ ۖ وَلَا يُفْلِحُ ٱلسَّاحِرُ حَيْثُ أَتَىٰ ﴿٦٩﴾ فَأُلْقِىَ ٱلسَّحَرَةُ سُجَّدًا قَالُوٓا۟ ءَامَنَّا بِرَبِّ هَٰرُونَ وَمُوسَىٰ ﴿٧٠﴾ قَالَ ءَامَنتُمْ لَهُۥ قَبْلَ أَنْ ءَاذَنَ لَكُمْ ۖ إِنَّهُۥ لَكَبِيرُكُمُ ٱلَّذِى عَلَّمَكُمُ ٱلسِّحْرَ ۖ فَلَأُقَطِّعَنَّ أَيْدِيَكُمْ وَأَرْجُلَكُم مِّنْ خِلَٰفٍ وَلَأُصَلِّبَنَّكُمْ فِى جُذُوعِ ٱلنَّخْلِ وَلَتَعْلَمُنَّ أَيُّنَآ أَشَدُّ عَذَابًا وَأَبْقَىٰ ﴿٧١﴾ قَالُوا۟ لَن نُّؤْثِرَكَ عَلَىٰ مَا جَآءَنَا مِنَ ٱلْبَيِّنَٰتِ وَٱلَّذِى فَطَرَنَا ۖ فَٱقْضِ مَآ أَنتَ قَاضٍ ۖ إِنَّمَا تَقْضِى هَٰذِهِ ٱلْحَيَوٰةَ ٱلدُّنْيَآ ﴿٧٢﴾ إِنَّآ ءَامَنَّا بِرَبِّنَا لِيَغْفِرَ لَنَا خَطَٰيَٰنَا وَمَآ أَكْرَهْتَنَا عَلَيْهِ مِنَ ٱلسِّحْرِ ۗ وَٱللَّهُ خَيْرٌ وَأَبْقَىٰٓ ﴿٧٣﴾ إِنَّهُۥ مَن يَأْتِ رَبَّهُۥ مُجْرِمًا فَإِنَّ لَهُۥ جَهَنَّمَ لَا يَمُوتُ فِيهَا وَلَا يَحْيَىٰ ﴿٧٤﴾ وَمَن يَأْتِهِۦ مُؤْمِنًا قَدْ عَمِلَ ٱلصَّٰلِحَٰتِ فَأُو۟لَٰٓئِكَ لَهُمُ ٱلدَّرَجَٰتُ ٱلْعُلَىٰ ﴿٧٥﴾ جَنَّٰتُ عَدْنٍ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَا ۚ وَذَٰلِكَ جَزَآءُ مَن تَزَكَّىٰ ﴿٧٦﴾

(٦٥) ئەوسا جادووگەران وتیان: ئەی موسا؛ یان تۆ دەستبەکاربە و (دار عەسای خۆت) فڕێ بدە، یان ئێمە سەرەتا دەست پێ دەکەین و فڕێی دەدەین؟

(٦٦) موسا وتی: نەخێر؛ ئێوە لە پێشدا دەست پێ بکەن، جا هەر کە دەستیان پێکرد پەت و گوریس و دارو چێوەکانیان وا دەهێنرایە بەرچاوی بەهۆی جادوویانەوە، بێگومان وەک مار بەخێرایی دەڕوات.

(٦٧) ئەوسا موسا هەستی کرد بە ترسێک لە دڵ و دەروونیدا.

(٦٨) (ئێمەش نیگامان بۆ کرد) وتمان: مەترسە و دڵنیابە چونکە بەڕاستی هەر تۆ بەرزو سەرکەوتوویت.

(٦٩) ئەوەش لەدەستی راستتدایە (واتە عەساکەت) فڕێی بدە، هەرچی ئەوانە کردوویانە دەیماشێتەوە و قووتی دەدات، چونکە بێگومان ئەوەی کردوویانە تەنها فێڵ و تەڵەکەی جادووگەرە، جادووگەریش بۆ هەر کوێ بچێت و هەرچی بکات سەرکەوتوو نابێت.

(٧٠) ئەوسا ئیتر هەموو جادووگەران، خران بە رووداو سوژدەیان برد بۆ خوا (راستییان بۆ دەرکەوت) وتیان: ئیتر ئێمە باوەڕێکی بەتینمان هێناوە بەپەروەردگاری هاروون و موسا.

(٧١) فیرعەون وتی: ئایا ئێوە هەر ئاوا باوەڕتان پێ هێنا پێش ئەوەی مۆڵەتتان بدەم و رازی بم؟ بەڕاستی دیارە موسا گەورە و مامۆستاتانە و هەر ئەو فێری جادووگەری کردوون، شەرت بێت دەست و قاچتان بە پێچەوانەوە بقرتێنم و هەڵتانواسم بەقەدی دارخورمادا ئەوسا چاک دەزانن کە کاممان (من، یان خوای موسا) سزامان توندو تیژو بەردەوامە!

(٧٢) (جادووگەرانی تاوێک لەمەوبەر، بەباوەڕێکی بەتینەوە) وتیان: هەرگیز تازە باوی تۆ نادەین بەسەر ئەم بەڵگە و نیشانانەدا کە بۆمان هاتووە سوێند بەو کەسەی کە دروستی کردووین، چیت لەدەست دێت ئەنجامی بدە و درێغی مەکە، بەڕاستی تۆ هەر دەتوانیت ژیانی ئەم دنیایەمان لێ زەوت بکەیت.

(٧٣) ئێمە ئیتر بەڕاستی باوەڕمان هێناوە بە پەروەردگارمان، تا لە گوناهەکانمان خۆش ببێت و لەو جادووگەرییەش کە بە زۆر پێت کردین، هەمیشە خوای گەورە لە هەموو کەس چاکترە و لە هەموو کەس پایەدارترو بەردەوامترە.

(٧٤) ئێمە دڵنیاین لەوەی، کە ئەوەی بە تاوان و گوناهەوە بگەڕێتەوە بۆ لای پەروەردگاری، بێگومان ئەوە دۆزەخ بۆی ئامادەیە کە نەدەمرێت تیایدا (تا لە سزا رزگاری ببێت) نە دەژی (بە ئارامی و ئاسوودەیی).

(٧٥) ئەو کەسەش بە ئیمانەوە بگەڕێتەوە بۆ لای و بەڕاستی کردەوە چاکەکانی ئەنجام دابێت، ئەوە بۆ ئەوانە پلەو پایەی بەرزو بڵند ئامادەیە...

(٧٦) بەهەشتی ـ عەدنە ـ کە باخەکانی چڕو پڕە دەچنە ناوی، چەندەها رووبار بەژێر درەختەکانیدا دەڕوات، هاوڕێ لەگەڵ ژیانی هەمیشەیی و نەبڕاوەدا، ئەوەش پاداشتی کەسێکە دڵ و دەروون و رەوشتی خۆی خاوێن کردبێت.

وَلَقَدْ أَوْحَيْنَآ إِلَىٰ مُوسَىٰٓ أَنْ أَسْرِ بِعِبَادِى فَٱضْرِبْ لَهُمْ طَرِيقًا فِى ٱلْبَحْرِ يَبَسًا لَّا تَخَٰفُ دَرَكًا وَلَا تَخْشَىٰ ﴿٧٧﴾ فَأَتْبَعَهُمْ فِرْعَوْنُ بِجُنُودِهِۦ فَغَشِيَهُم مِّنَ ٱلْيَمِّ مَا غَشِيَهُمْ ﴿٧٨﴾ وَأَضَلَّ فِرْعَوْنُ قَوْمَهُۥ وَمَا هَدَىٰ ﴿٧٩﴾ يَٰبَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ قَدْ أَنجَيْنَٰكُم مِّنْ عَدُوِّكُمْ وَوَٰعَدْنَٰكُمْ جَانِبَ ٱلطُّورِ ٱلْأَيْمَنَ وَنَزَّلْنَا عَلَيْكُمُ ٱلْمَنَّ وَٱلسَّلْوَىٰ ﴿٨٠﴾ كُلُوا۟ مِن طَيِّبَٰتِ مَا رَزَقْنَٰكُمْ وَلَا تَطْغَوْا۟ فِيهِ فَيَحِلَّ عَلَيْكُمْ غَضَبِى ۖ وَمَن يَحْلِلْ عَلَيْهِ غَضَبِى فَقَدْ هَوَىٰ ﴿٨١﴾ وَإِنِّى لَغَفَّارٌ لِّمَن تَابَ وَءَامَنَ وَعَمِلَ صَٰلِحًا ثُمَّ ٱهْتَدَىٰ ﴿٨٢﴾ ۞ وَمَآ أَعْجَلَكَ عَن قَوْمِكَ يَٰمُوسَىٰ ﴿٨٣﴾ قَالَ هُمْ أُو۟لَآءِ عَلَىٰٓ أَثَرِى وَعَجِلْتُ إِلَيْكَ رَبِّ لِتَرْضَىٰ ﴿٨٤﴾ قَالَ فَإِنَّا قَدْ فَتَنَّا قَوْمَكَ مِنۢ بَعْدِكَ وَأَضَلَّهُمُ ٱلسَّامِرِىُّ ﴿٨٥﴾ فَرَجَعَ مُوسَىٰٓ إِلَىٰ قَوْمِهِۦ غَضْبَٰنَ أَسِفًا ۚ قَالَ يَٰقَوْمِ أَلَمْ يَعِدْكُمْ رَبُّكُمْ وَعْدًا حَسَنًا ۚ أَفَطَالَ عَلَيْكُمُ ٱلْعَهْدُ أَمْ أَرَدتُّمْ أَن يَحِلَّ عَلَيْكُمْ غَضَبٌ مِّن رَّبِّكُمْ فَأَخْلَفْتُم مَّوْعِدِى ﴿٨٦﴾ قَالُوا۟ مَآ أَخْلَفْنَا مَوْعِدَكَ بِمَلْكِنَا وَلَٰكِنَّا حُمِّلْنَآ أَوْزَارًا مِّن زِينَةِ ٱلْقَوْمِ فَقَذَفْنَٰهَا فَكَذَٰلِكَ أَلْقَى ٱلسَّامِرِىُّ ﴿٨٧﴾



(٧٧) (دوای تێپەڕ بوونی چەند ساڵێک) سوێند بە خوا بەڕاستی نیگامان بۆ موسا کرد کە شەوڕەوی بکە بەبەندەکانم و ڕێگەیەکی وشکیان لە دەریادا بۆ دابین بکە و لەکاتێکدا ترسی ئەوەت نی یە کە پێت بگەن و خەمی نوقم بوون و تیاچوونیشت نی یە.

(٧٨) ئەوسا فیرعەون بە سەربازانیەوە شوێنیان کەوتن، کوتوپڕ لەناو ئاوەکەدا شەپۆلی دەریا دای بەسەریانداو هەموویانی داپۆشی بەچ داپۆشینێک!

(٧٩) فیرعەونیش قەوم و گەلەکەی خۆی گومڕا کردو ڕێنموویی نەکردن.

(٨٠) (پاشان خوا؛ ڕوو بە نەوەی ئیسرائیل دەفەرموێت): ئەی نەوەی ئیسرائیل بێگومان ئێمە ئێوەمان لە دەست دوژمنەکەتان ڕزگار کردو بەڵێنیشمان دانێ کە لەلای ڕاستی کێوی طوردا (پەیمانتان لێ وەربگرین)، گەزۆ و شەلاقەشمان بۆ دابین کردن.

(٨١) بخۆن لەو ڕزق و ڕۆزیە پاک و چاکانەی کە پێمان بەخشیوون و زیادڕەوی و گوناهکاری و فێڵ و تەڵەکەی تێدا مەکەن، بۆ ئەوەی خەشم و قینی من داتاننەگرێتەوە، بێگومان ئەوەی خەشم و قینی من دایبگرێت، ئەوە ئیتر کەوتووە و تیاچووە.

(٨٢) دڵنیاش بن بەڕاستی من زۆر لێخۆش بووم لەو کەسەی کە تەوبە دەکات و باوەڕ دەهێنێت و کاروکردەوەی چاکە دەکات، لەوەودوا (تا دوا هەناسەی ژیانی) بەردەوام دەبێت لەسەرئەو ڕێبازە.

(٨٣) (لەوەودوا موسا خۆی گەیاندە کێوی طور، خوای گەورە لێی پرسی:) ئەی موسا بۆچی تۆ پەلەت کردو قەومەکەت بەجێ هێشت.

(٨٤) موسا وتی: ئەوان لەسەر ڕێبازی من دەڕۆن، (بەڵام من ئارەزوومەندی گفتوگۆت بووم) بۆیە بەپەلە هاتم تا تۆ ئەی پەروەردگارم لێم ڕازی بیت (فەرمانە پیرۆزەکانت وەربگرم).

(٨٥) پەروەردگار فەرمووی: بێگومان ئێمە قەومەکەتمان لە دوای هاتنی تۆ تاقیکردەوە (کەچی سەرکەوتوو نەبوون، باوەڕ دامەزراو نەبوون) کابرای سامیری گومڕای کردن.

(٨٦) پاشان موسا گەڕایەوە بۆ ناو قەومەکەی، بەتووڕەیی و داخ و خەفەتێکی زۆرەوە، وتی: ئەی قەومەکەم، مەگەر پەروەردگارتان بەڵێنی چاکی نەدابوونێ (کە سەرفرازتان بکات لە دنیاو قیامەتدا) ئایا ئەو بەڵێن و پەیمانە زۆری پێچووە؟ یاخود ویستتان خەشم و قین لەلایەن پەروەردگارتانەوە دابارێت بەسەرتاندا، بۆیە ئیتر ئێوە ئەو بەڵێنەی دابووتان بە من نەتان بردەسەر (کە پابەندیی یەکخواناسی بن؟!).

(٨٧) خەڵکەکە وتیان: ئێمە سەرپێچی کردنمان لە بەڵێنەکەی تۆ بەئارەزووی خۆمان نەبووە، حەزمان لە سەرپێچی نەکردووە، بەڵام ئێمە زێڕو زیوێکی زۆری ـ قبطي ـ یەکان درابوو بەسەرماندا، جا ئیتر فڕێمانداو سامیریش بەو شێوەیە فڕێیدا...

فَأَخْرَجَ لَهُمْ عِجْلًا جَسَدًا لَّهُۥ خُوَارٌ فَقَالُوا۟ هَٰذَآ إِلَٰهُكُمْ وَإِلَٰهُ مُوسَىٰ فَنَسِىَ ﴿٨٨﴾ أَفَلَا يَرَوْنَ أَلَّا يَرْجِعُ إِلَيْهِمْ قَوْلًا وَلَا يَمْلِكُ لَهُمْ ضَرًّا وَلَا نَفْعًا ﴿٨٩﴾ وَلَقَدْ قَالَ لَهُمْ هَٰرُونُ مِن قَبْلُ يَٰقَوْمِ إِنَّمَا فُتِنتُم بِهِۦ ۖ وَإِنَّ رَبَّكُمُ ٱلرَّحْمَٰنُ فَٱتَّبِعُونِى وَأَطِيعُوٓا۟ أَمْرِى ﴿٩٠﴾ قَالُوا۟ لَن نَّبْرَحَ عَلَيْهِ عَٰكِفِينَ حَتَّىٰ يَرْجِعَ إِلَيْنَا مُوسَىٰ ﴿٩١﴾ قَالَ يَٰهَٰرُونُ مَا مَنَعَكَ إِذْ رَأَيْتَهُمْ ضَلُّوٓا۟ ﴿٩٢﴾ أَلَّا تَتَّبِعَنِ ۖ أَفَعَصَيْتَ أَمْرِى ﴿٩٣﴾ قَالَ يَبْنَؤُمَّ لَا تَأْخُذْ بِلِحْيَتِى وَلَا بِرَأْسِىٓ ۖ إِنِّى خَشِيتُ أَن تَقُولَ فَرَّقْتَ بَيْنَ بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ وَلَمْ تَرْقُبْ قَوْلِى ﴿٩٤﴾ قَالَ فَمَا خَطْبُكَ يَٰسَٰمِرِىُّ ﴿٩٥﴾ قَالَ بَصُرْتُ بِمَا لَمْ يَبْصُرُوا۟ بِهِۦ فَقَبَضْتُ قَبْضَةً مِّنْ أَثَرِ ٱلرَّسُولِ فَنَبَذْتُهَا وَكَذَٰلِكَ سَوَّلَتْ لِى نَفْسِى ﴿٩٦﴾ قَالَ فَٱذْهَبْ فَإِنَّ لَكَ فِى ٱلْحَيَوٰةِ أَن تَقُولَ لَا مِسَاسَ ۖ وَإِنَّ لَكَ مَوْعِدًا لَّن تُخْلَفَهُۥ ۖ وَٱنظُرْ إِلَىٰٓ إِلَٰهِكَ ٱلَّذِى ظَلْتَ عَلَيْهِ عَاكِفًا ۖ لَّنُحَرِّقَنَّهُۥ ثُمَّ لَنَنسِفَنَّهُۥ فِى ٱلْيَمِّ نَسْفًا ﴿٩٧﴾ إِنَّمَآ إِلَٰهُكُمُ ٱللَّهُ ٱلَّذِى لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ۚ وَسِعَ كُلَّ شَىْءٍ عِلْمًا ﴿٩٨﴾

(٨٨) بەو زێڕو زیوە پەیکەری گوێرەکەیەکی بۆ دروست کردن (جارجار) بۆڕەیەکی دەکرد، (سامیری و بێدینەکان بێ شەرمانە) وتیان: ئەمە خوای ئێوە و خوای موسایە، ئەو لە بیری چووە و (بەشوێنیدا دەگەڕێت).

(٨٩) جا ئایا ئەوانەفامانە نازانن ئەو گوێرەکەیە وەڵامی هیچ قسەیەکیان ناداتەوە؛ هیچ زەرەر، یان قازانجێکی بۆیان نیە؟!

(٩٠) بێگومان پێشتریش هاروون پێی وتن: ئەی قەومی من؛ ئێوە بەم گوێرەکە زێڕینە تووشی تاقیکردنەوەیەکی سەخت بوون و تیایدا دەرنەچوون، دڵنیابن کە پەروەردگارتان خوایەکی میهرەبانە، شوێنی من بکەون و گوێڕایەڵی فەرمانی من بن.

(٩١) کەچی وتیان: هەرگیز وازی لێ ناهێنین و بەدەوریدا دێین و دەیپەرستین هەتا موسا خۆی دەگەڕێتەوە!!

(٩٢) (موسا، کە گەڕایەوە بە تووڕەییەوە) وتی: ئەی هاروون، چی وای لێ کردیت (بێ دەنگ بیت) و هیچ نەکەیت، کاتێک بینیتن ئاوا گومڕا بوون؟

(٩٣) چی وای لێ کردیت پەیڕەوی من نەکەیت ؟! ئایا لە فەرمانی من یاخی بوویت؟!

(٩٤) هاروون وتی: کوڕی دایکم (بۆ ئەوەی سۆزی بجوڵێنێت) ریشم مەگرە و قژم رامەکێشە، (من بۆیە زۆر لەسەری نەچووم) بێگومان ترسام دوایی پێم بڵێیت: تۆ جیاوازیت خستە ناو نەوەی ئیسرائیلەوە و گوێت بەقسەی من نەدا.

(٩٥) (ئینجا موسا رووی کردە کابرای سامیری) وتی: ئەی سامیری، ئەوکارە خەتەرناکە چییە کە ئەنجامت داوە؟ (ئەم پیلان و تەڵەکە و فێڵە چییە دروستت کردووە)؟!

(٩٦) سامیری وتی: ئەوەی من بینیم، ئەوان نەیانبینی، من مشتێکم لە شوێن پێی (ئەسپەکەی) جوبرەئیل هەڵگرت و فڕێمدایە ناو پەیکەرەکەوە، بەو شێوەیە نەفسی بەدکردارم ئەو کارەی پێکردم (یاخود دەگونجێت سامیری درۆ بکات، تا خۆی لە خەشمی حەزرەتی موسا رزگار بکات و جادوویەکی ئەنجام دابێت).

(٩٧) (موسا بە سامیری) وت: دەبڕۆ تا ماوی لە ژیاندا (هەر کەسێک نزیکت کەوتەوە دەبێت) بڵێیت: بە هیچ شێوەیەک بەریەککەوتن نی یە (دیارە کە دەستی هەرکەسی بەرکەوتبێت تووشی ئازارێکی زۆر بووە)، دڵنیاش بە کە کاتێکی تریشت بۆ دیاری کراوە، کە هەرگیز ناتوانیت لێی دەرباز ببیت، سەرنجی خواکەشت بدە کە بەدەوریدا دەسوڕایتەوە و دەتپەرست، دەبێت بیسوتێنین و هەلا هەلای بکەین و بیخەینە ناو دەریاوە.

(٩٨) خەڵکینە؛ ئێوە دڵنیابن کە پەروەردگارتان تەنها زاتی (ٱللَّه) یە، جگە لەو خوایەکی تر نیە، زانیاری و زانستی ئەو زاتە هەموو شتێکی گرتۆتەوە.

كَذَٰلِكَ نَقُصُّ عَلَيْكَ مِنْ أَنبَاءِ مَا قَدْ سَبَقَ وَقَدْ ءَاتَيْنَاكَ مِن لَّدُنَّا ذِكْرًا ﴿٩٩﴾ مَّنْ أَعْرَضَ عَنْهُ فَإِنَّهُ يَحْمِلُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ وِزْرًا ﴿١٠٠﴾ خَالِدِينَ فِيهِ وَسَاءَ لَهُمْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ حِمْلًا ﴿١٠١﴾ يَوْمَ يُنفَخُ فِي الصُّورِ وَنَحْشُرُ الْمُجْرِمِينَ يَوْمَئِذٍ زُرْقًا ﴿١٠٢﴾ يَتَخَافَتُونَ بَيْنَهُمْ إِن لَّبِثْتُمْ إِلَّا عَشْرًا ﴿١٠٣﴾ نَّحْنُ أَعْلَمُ بِمَا يَقُولُونَ إِذْ يَقُولُ أَمْثَلُهُمْ طَرِيقَةً إِن لَّبِثْتُمْ إِلَّا يَوْمًا ﴿١٠٤﴾ وَيَسْأَلُونَكَ عَنِ الْجِبَالِ فَقُلْ يَنسِفُهَا رَبِّي نَسْفًا ﴿١٠٥﴾ فَيَذَرُهَا قَاعًا صَفْصَفًا ﴿١٠٦﴾ لَّا تَرَىٰ فِيهَا عِوَجًا وَلَا أَمْتًا ﴿١٠٧﴾ يَوْمَئِذٍ يَتَّبِعُونَ الدَّاعِيَ لَا عِوَجَ لَهُ وَخَشَعَتِ الْأَصْوَاتُ لِلرَّحْمَٰنِ فَلَا تَسْمَعُ إِلَّا هَمْسًا ﴿١٠٨﴾ يَوْمَئِذٍ لَّا تَنفَعُ الشَّفَاعَةُ إِلَّا مَنْ أَذِنَ لَهُ الرَّحْمَٰنُ وَرَضِيَ لَهُ قَوْلًا ﴿١٠٩﴾ يَعْلَمُ مَا بَيْنَ أَيْدِيهِمْ وَمَا خَلْفَهُمْ وَلَا يُحِيطُونَ بِهِ عِلْمًا ﴿١١٠﴾ ۞ وَعَنَتِ الْوُجُوهُ لِلْحَيِّ الْقَيُّومِ وَقَدْ خَابَ مَنْ حَمَلَ ظُلْمًا ﴿١١١﴾ وَمَن يَعْمَلْ مِنَ الصَّالِحَاتِ وَهُوَ مُؤْمِنٌ فَلَا يَخَافُ ظُلْمًا وَلَا هَضْمًا ﴿١١٢﴾ وَكَذَٰلِكَ أَنزَلْنَاهُ قُرْءَانًا عَرَبِيًّا وَصَرَّفْنَا فِيهِ مِنَ الْوَعِيدِ لَعَلَّهُمْ يَتَّقُونَ أَوْ يُحْدِثُ لَهُمْ ذِكْرًا ﴿١١٣﴾



(٩٩) ئەی محمد ﷺ : ئێمە بێگومان ئا بەو شێوەیە هەندێک لە بەسەرهاتی ئەوانەی رابوورد بۆت دەگێرینەوە، دڵنیابە ئێمە لەلایەن خۆمانەوە قورئانمان پێ بەخشیویت کە یاداوەری بێت لە هەموو روویەکەوە.

(١٠٠) ئەوەی پشتی تێ کردبێت، ئەوە بێگومان لە رۆژی قیامەتدا کۆڵێک گوناه هەڵدەگرێت.

(١٠١) (ئەو جۆرە کەسانە) لەناو سزادا بۆ هەمیشە دەمێننەوە، ئای چەند خراپە ئەو کۆڵە قورسەی کە لە قیامەتدا بەکۆڵیانەوەیە.

(١٠٢) رۆژێک دێت فوو دەکرێت بە ـ صور ـ دا، ئەو رۆژە تاوانباران چاویان کوێرەو شین هەڵگەراوە (دیمەنێکی ناشیرین و سامناکیان هەیە).

(١٠٣) بەچپەو سرتە بەیەک دەڵێن: تەنها دە شەو نەبێت؛ (لە دنیادا یان لە جیهانی بەرزەخدا) هیچی ترتان پێچووە.

(١٠٤) ئێمە چاک دەزانین سەرەنجام چی دەڵێن چونکە ژیرترین و وریاترینیان دەڵێت: تەنها رۆژێک نەبێت هیچی ترتان پێ نەچووە!!

(١٠٥) پرسیارت لێدەکەن دەربارەی کێوەکان (کە لە بەرپا بوونی قیامەتدا چیان بەسەر دێت)، ئەی محمد ﷺ تۆ پێیان بڵێ: پەروەردگارم هەڵی دەتەکێنێت و وردو خاشی دەکات...

(١٠٦) جا پەرش و بڵاوی دەکاتەوە و دەیکاتە زەویەکی پان و تەخت و بەرین وازی لێ دەهێنێت و بەجێی دەهێڵێت.

(١٠٧) هیچ خوارو خێچی و بەرزی و نزمیەک لەسەر رووکاری نابینیت.

(١٠٨) لەو رۆژەدا هەموو خەڵکی شوێنی جارچەری کۆکردنەوە دەکەون، هیچ سەرپێچی و لاریەک ناکرێت، هەموو دەنگەکان لەبەر پەروەردگاری میهرەبان نزمن و بەهێواشی دەدوێن، تەنها چپە و سرتەیەکی کەم نەبێت هیچی تر نابیستیت.

(١٠٩) لەو رۆژەدا تکاو شەفاعەت وەرناگیرێت و بێسوودە، مەگەر لە کەسێک خوای میهرەبان مۆڵەتی بدات و رازی بێت بەوەی قسەی بۆ بکرێت و قسەی لێ وەربگیرێت.

(١١٠) خوا بە هەموو ئەو شتانە دەزانێت (کە لە قیامەتدا) چاوەڕێیانەو بە هەموو ئەو شتانەی (کە لە دنیادا) ئەنجامیان داوە و ئەو خەڵکە هەرگیز ناتوانن ئاگاداری زانست و زانیاری بێ سنووری ئەو زاتە پەی ببەن.

(١١١) هەرچی رووخسارەکانە (لە رۆژی قیامەتدا) ملکەچ و فەرمانبەردارن، بۆ ئەو زاتەی کە هەمیشە زیندووە و دەسەڵاتی بێ سنووری هەیە، بێگومان ئەوەی ستەمی کردووە؛ رەنج بەخەسارو نائومێدو بێ هیوایە.

(١١٢) ئەوەش کە کارو کردەوە چاکەکان ئەنجام دەدات و لەکاتێکدا ئیمانداریش بووبێت، ئەوە ئیتر ناترسێت لەوەی ستەمی لێ بکرێت یان مافی پێشێل بکرێت.

(١١٣) ئا بەو شێوەیە ئێمە قورئانێکی عەرەبی و پاراو و رەوانمان دابەزاندووە و جۆرەها هەڕەشەشمان تیادا باس کردووە، بۆ ئەوەی لە خوا بترسن و یاخود ببێتە هۆی ئەوەی کە یاداوەریان تێدا بەدی بهێنێت.

فَتَعَٰلَى ٱللَّهُ ٱلْمَلِكُ ٱلْحَقُّ ۗ وَلَا تَعْجَلْ بِٱلْقُرْءَانِ مِن قَبْلِ أَن يُقْضَىٰٓ إِلَيْكَ وَحْيُهُۥ ۖ وَقُل رَّبِّ زِدْنِى عِلْمًا ﴿١١٤﴾ وَلَقَدْ عَهِدْنَآ إِلَىٰٓ ءَادَمَ مِن قَبْلُ فَنَسِىَ وَلَمْ نَجِدْ لَهُۥ عَزْمًا ﴿١١٥﴾ وَإِذْ قُلْنَا لِلْمَلَٰٓئِكَةِ ٱسْجُدُوا۟ لِءَادَمَ فَسَجَدُوٓا۟ إِلَّآ إِبْلِيسَ أَبَىٰ ﴿١١٦﴾ فَقُلْنَا يَٰٓـَٔادَمُ إِنَّ هَٰذَا عَدُوٌّ لَّكَ وَلِزَوْجِكَ فَلَا يُخْرِجَنَّكُمَا مِنَ ٱلْجَنَّةِ فَتَشْقَىٰٓ ﴿١١٧﴾ إِنَّ لَكَ أَلَّا تَجُوعَ فِيهَا وَلَا تَعْرَىٰ ﴿١١٨﴾ وَأَنَّكَ لَا تَظْمَؤُا۟ فِيهَا وَلَا تَضْحَىٰ ﴿١١٩﴾ فَوَسْوَسَ إِلَيْهِ ٱلشَّيْطَٰنُ قَالَ يَٰٓـَٔادَمُ هَلْ أَدُلُّكَ عَلَىٰ شَجَرَةِ ٱلْخُلْدِ وَمُلْكٍ لَّا يَبْلَىٰ ﴿١٢٠﴾ فَأَكَلَا مِنْهَا فَبَدَتْ لَهُمَا سَوْءَٰتُهُمَا وَطَفِقَا يَخْصِفَانِ عَلَيْهِمَا مِن وَرَقِ ٱلْجَنَّةِ ۚ وَعَصَىٰٓ ءَادَمُ رَبَّهُۥ فَغَوَىٰ ﴿١٢١﴾ ثُمَّ ٱجْتَبَٰهُ رَبُّهُۥ فَتَابَ عَلَيْهِ وَهَدَىٰ ﴿١٢٢﴾ قَالَ ٱهْبِطَا مِنْهَا جَمِيعًۢا ۖ بَعْضُكُمْ لِبَعْضٍ عَدُوٌّ ۖ فَإِمَّا يَأْتِيَنَّكُم مِّنِّى هُدًى فَمَنِ ٱتَّبَعَ هُدَاىَ فَلَا يَضِلُّ وَلَا يَشْقَىٰ ﴿١٢٣﴾ وَمَنْ أَعْرَضَ عَن ذِكْرِى فَإِنَّ لَهُۥ مَعِيشَةً ضَنكًا وَنَحْشُرُهُۥ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ أَعْمَىٰ ﴿١٢٤﴾ قَالَ رَبِّ لِمَ حَشَرْتَنِىٓ أَعْمَىٰ وَقَدْ كُنتُ بَصِيرًا ﴿١٢٥﴾

(١١٤) خوای گەورە زۆر پایە بەرزو بڵندە و پاشای بە حەق و راستەقینەیە، (ئەی محمد ﷺ) نەکەیت لە خوێندنی قورئاندا پەلە بکەیت؛ لە پێش ئەوەی وەحی و نیگای ئەو قورئانە تەواو ببێت بۆ لای تۆ (چونکە ئێمە نایەڵین فەرامۆشی بکەیت) نزا بکە و بڵێ: پەروەردگارا، بەردەوام زانست و زانیاری زۆرترو زیاترم پێ ببەخشە.

(١١٥) سوێند بەخوا بێگومان ئێمە پێشتر پەیمانمان لە ئادەم وەرگرت (کە نزیکی درەختی قەدەغە کراو نەکەوێت) کەچی بیری چوو، بە مەرجێک ئەمانبینی پێشتر بڕیاری کردنی ئەو سەرپێچییە بدات.

(١١٦) سەردەمێک بەفرشتەکانمان وت: سوژدە بەرن بۆ ئادەم، هەموو سوژدەیان برد، جگە لە ئیبلیس کە سەرسەخت و یاخی بوو.

(١١٧) جا وتمان: ئەی ئادەم، بەڕاستی ئەم (ئیبلیسە) دوژمنی خۆت و هاوسەرەکەتە، وریابن لە بەهەشت بەدەرکردنتان نەدات، بەو هۆیەوە تووشی ناخۆشی و نەگبەتی و دەربەدەری ببن.

(١١٨) دڵنیاشبە تۆ لە بەهەشتدا نەبرسیت دەبێت نەرووت و ڕەجاڵ دەبیت و...

(١١٩) نەتینوشت دەبێت و نەگەرماش زۆرت بۆ دەهێنێت.

(١٢٠) جا شەیتان گومانی خستە دڵیەوە و پێی وت: ئەی ئادەم پێت بڵێم و نیشانت بدەم درەختی نەمری و موڵک و داراییەک کە بەسەرناچێت کامەیە؟!!

(١٢١) (شەیتان هەر کۆڵی نەدا تا فریوی دان) هەردووکیان لە بەروبوومی درەختەکەیان خوارد (ئیتر جل و بەرگ و پۆشاکیان داماڵرا)، عەیب و عاریان دەرکەوت، بەپەلە هەوڵیاندا بەگەڵای درەختەکانی بەهەشت (خۆیان داپۆشن) نابەو شێوەیە ئادەم یاخی بوو لە پەروەردگاری و فریوی خواردو ڕێگای لێ تێکچوو، پاشان پەروەردگاری هەڵی بژارد و (کردی بە پێغەمبەر) تەوبەی لێ وەرگرت و هیدایەت و ڕێنموویی کرد.

(١٢٣) (ئەوسا خوای گەورە فەرمانیدا) وتی: ئیتر هەردووکتان لە بەهەشت دابەزن بەگشتی، هەندێکتان دەبنە دوژمنی هەندێکتان، جا ئەگەر هیدایەت و ڕێنموویی من بۆ ئێوە هات، ئەوەی شوێنی بەرنامەکەم بکەوێت، نەگومڕا دەبێت، نە ناخۆشی و نارەحەتی و ناسۆر دێتە ڕێی.

(١٢٤) ئەوەیش روو وەربگێڕێت لە بەرنامە و یادی من و پشتی تێ بکات، بێگومان بۆ ئەو جۆرە کەسانە ژیانێکی ترش و تاڵ و ناخۆش پێش دێت، لە ڕۆژی قیامەتیشدا بەکوێری حەشری دەکەین ...

(١٢٥) ئەو جۆرە کەسە دەڵێت: ئەی پەروەردگار بۆ بەکوێری حەشرت کردم خۆ من کاتی خۆی چاوساغ و بینا بووم.

قَالَ كَذَٰلِكَ أَتَتْكَ ءَايَٰتُنَا فَنَسِيتَهَا ۖ وَكَذَٰلِكَ ٱلْيَوْمَ تُنسَىٰ ﴿١٢٦﴾ وَكَذَٰلِكَ نَجْزِي مَنْ أَسْرَفَ وَلَمْ يُؤْمِنۢ بِـَٔايَٰتِ رَبِّهِۦ ۚ وَلَعَذَابُ ٱلْـَٔاخِرَةِ أَشَدُّ وَأَبْقَىٰٓ ﴿١٢٧﴾ أَفَلَمْ يَهْدِ لَهُمْ كَمْ أَهْلَكْنَا قَبْلَهُم مِّنَ ٱلْقُرُونِ يَمْشُونَ فِي مَسَٰكِنِهِمْ ۗ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَـَٔايَٰتٍ لِّأُو۟لِي ٱلنُّهَىٰ ﴿١٢٨﴾ وَلَوْلَا كَلِمَةٌ سَبَقَتْ مِن رَّبِّكَ لَكَانَ لِزَامًا وَأَجَلٌ مُّسَمًّى ﴿١٢٩﴾ فَٱصْبِرْ عَلَىٰ مَا يَقُولُونَ وَسَبِّحْ بِحَمْدِ رَبِّكَ قَبْلَ طُلُوعِ ٱلشَّمْسِ وَقَبْلَ غُرُوبِهَا ۖ وَمِنْ ءَانَآئِ ٱلَّيْلِ فَسَبِّحْ وَأَطْرَافَ ٱلنَّهَارِ لَعَلَّكَ تَرْضَىٰ ﴿١٣٠﴾ وَلَا تَمُدَّنَّ عَيْنَيْكَ إِلَىٰ مَا مَتَّعْنَا بِهِۦٓ أَزْوَٰجًا مِّنْهُمْ زَهْرَةَ ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا لِنَفْتِنَهُمْ فِيهِ ۚ وَرِزْقُ رَبِّكَ خَيْرٌ وَأَبْقَىٰ ﴿١٣١﴾ وَأْمُرْ أَهْلَكَ بِٱلصَّلَوٰةِ وَٱصْطَبِرْ عَلَيْهَا ۖ لَا نَسْـَٔلُكَ رِزْقًا ۖ نَّحْنُ نَرْزُقُكَ ۗ وَٱلْعَٰقِبَةُ لِلتَّقْوَىٰ ﴿١٣٢﴾ وَقَالُوا۟ لَوْلَا يَأْتِينَا بِـَٔايَةٍ مِّن رَّبِّهِۦٓ ۚ أَوَلَمْ تَأْتِهِم بَيِّنَةُ مَا فِي ٱلصُّحُفِ ٱلْأُولَىٰ ﴿١٣٣﴾ وَلَوْ أَنَّآ أَهْلَكْنَٰهُم بِعَذَابٍ مِّن قَبْلِهِۦ لَقَالُوا۟ رَبَّنَا لَوْلَآ أَرْسَلْتَ إِلَيْنَا رَسُولًا فَنَتَّبِعَ ءَايَٰتِكَ مِن قَبْلِ أَن نَّذِلَّ وَنَخْزَىٰ ﴿١٣٤﴾ قُلْ كُلٌّ مُّتَرَبِّصٌ فَتَرَبَّصُوا۟ ۖ فَسَتَعْلَمُونَ مَنْ أَصْحَٰبُ ٱلصِّرَٰطِ ٱلسَّوِيِّ وَمَنِ ٱهْتَدَىٰ ﴿١٣٥﴾

(١٢٦) (لە وەڵامدا خوا) دەفەرموێت: تۆ ئا بەو شێوەیە بوویت (کوێر بوویت لە ئاستی) ئایەت و بەڵگەکانی ئێمەدا کاتێک پێت رادەگەیەنرا، ئێمەش ئەمڕۆ ئاوا مامەڵەی کەسێکی لەبیرکراوت لەگەڵدا دەکەین (لە سزاو ئازاردا دەهێڵرێیتەوە).

(١٢٧) ئا بەو شێوەیە، تۆڵە دەکەینەوە لەو کەسەی کە لە سنوور دەترازێت و باوەڕ بەئایەت و فەرمانەکانی پەروەردگاری ناهێنێت، بێگومان سزای قیامەت زۆر سەخت ترو بەردەوامترە (لە سزای دنیا).

(١٢٨) ئایا بۆیان روون نەبۆتەوە کە چەندەها نەوەمان پێش ئەمان لەناو بردووە، بەناو شوێنەوارو ماڵ و حاڵیاندا هاتوچۆ دەکەن، بەڕاستی ئا لەو بەسەرهاتانەدا بەڵگە و نیشانەی زۆرهەیە بۆ خاوەن بیرو هۆشمەندەکان.

(١٢٩) خۆ ئەگەر بڕیارێک لەلایەن پەروەردگارتەوە پێش نەکەوتایەو مۆڵەتی دیاریکراویش نەبوایە، ئەوە لەناو بردنی خوانەناسان شتێکی ئەنجامدراو دەبوو.

(١٣٠) کەواتە ئەی محمد ﷺ، ئەی ئیماندار خۆڕاگر بە بەرامبەر ئەو گوفتارە نابەجێیانەیان کە دەیڵێن و تەسبیحات و ستایش و سوپاسی پەرورەدگارت بکە، پێش هەڵهاتنی خۆرو پێش ئاوابوونی، لە هەندێک کاتەکانی شەودا هەر تەسبیحات و ستایشی بکە، لە بەشە جیا جیاکانی رۆژیشدا هەر تەسبیحات و ستایشی بکە، بۆ ئەوەی لە رەزامەندی پەروەردگار بەهرەمەند ببیت.

(١٣١) (ئەی ئیماندار) تۆ چاوەکانت مەبڕە ئەو نازو نیعمەتەی کە هەندێک خەڵکمان لێ بەهرەوەر کردووە، کە زینەت و رازاوەی ژیانی دنیایە، بۆ ئەوەی لەو نازو نیعمەتە تاقیانبکەینەوە، بێگومان رزق و رۆزی پەروەردگارت (لە بەهەشتدا) چاکترو بەردەوامترە.

(١٣٢) (ئەی پێغەمبەر ﷺ، ئەی ئیماندار) فەرمان بدە بە هەر هەموو تاکەکانی خێزانت، تا نوێژەکەیان (بەچاکی ئەنجام بدەن، چونکە خۆراکی رۆحە) و بەردەوام و کۆڵنەدەر و خۆڕاگربە لەسەری، ئێمە بێگومان داوای رزق و رۆزی لە تۆ ناکەین، بەڵکو ئێمە رزق و رۆزی بەتۆ دەبەخشین، سەرەنجامی چاک هەر بۆ خواناسی و دینداریە.

(١٣٣) (کافرەکانی مەککە) وتیان: باشە، ئەوە بۆ لەلایەن پەروەردگاریەوە موعجیزەیەکی بۆ ئێمە نەهێناو (نیشانی نەداین)، مەگەر باسی (ئەو موعجیزانە) لە کتێبە پێشووەکاندا روون نەکراوەتەوە؟ (کاتی خۆی نیشانی قەومە پێشووەکانمان داوە بەڵام خۆ باوەڕیان نەهێناوە، بۆ ئەمانیشی پێش بهێنین هەر باوەڕ ناهێنن).

(١٣٤) خۆ ئەگەر بەڕاستی ئێمەیش پێش ناردنی قورئان و پێغەمبەر لەناومان ببردنایە، ئەوە دەیانوت: پەروەردگارا، بۆچی پێغەمبەرێکت بۆ رەوانە نەکردین، تا شوێنی بەرنامە و ئایەتەکانی تۆ بکەوین پێش ئەوەی زەلیل و ریسوا ببین.

(١٣٥) (ئەی پێغەمبەر بە دوژمنانی دین) بڵێ: هەموولایەک چاوەڕوانن، دە ئێوەش چاوەڕێ بن لە ئایندەدا دەزانن کە کێ خاوەنی بەرنامە و رێبازی راست و دروستە و کێش رێبازی هیدایەتی گرتۆتە بەر.



سورەتی (الأنبیـاء)

بەناوی خوای بەخشندە و میهرەبان

(١) موحاسەبە و لێ پرسینەوەی خەڵکی نزیک بۆتەوە، لەکاتێکدا (زۆربەی) ئەوان بێ ئاگا و غافڵن و پشتیان لە ئاینی خوا کردووە و روو وەرگێڕن (لە بەرنامەکەی).

(٢) هیچ یاداوەریەکی تازەیان لەلایەن پەروەردگاریانەوە بۆ نایەت کە ئەوان گوێ بیستی نەبوو بن و لەو کاتەدا یاری و گەمەی پێنەکەن...

(٣) دڵەکانیان بێ سناگاو سەرگەردانە، ئەوانەش کە ستەمیان کرد، قسەکانیان شاردەوە (پەنهێنی دەیانوت) ئایا ئەمە تەنها بەشەرێک نیە وەک ئێوە؟! ئایا ئێوە بەدەم جادووگەریەوە دەچن؟! لەکاتێکدا ئێوە چاوتان هەیە و دەبینن!!

(٤) (خوای گەورە پێغەمبەرەکەی لە باس و خواسیان ئاگادارکرد بۆیە) وتی: پەروەردگارم ئاگاداری هەموو قسە و گوفتارێکە لە ئاسمان و زەویدا و ئەو زاتە بیسەرو زانایە.

(٥) بەڵکو(شتی تریشیان) دەوت: (وەک ئەوەی کە گوایە ئەم قورئانە) : خەوو خەیاڵی بێ سەرو بنە، یاخود خۆی هەڵی بەستووە، بەڵکو ئەو کەسێکی شاعیرە، دەبا بەڵگە و موعجیزەیەک بهێنێت وەکو پێغەمبەرانی پێشوو!!

(٦) ئەو شارو شارۆچکە و دێهاتانەی پێش ئەمان (کە داوای موعجیزەیان کردووە و دوایی باوەڕیان نەهێناوە) لەناومان بردوون، ئایا ئەمان باوەڕ دەهێنن؟! (ئایا ئەوان باوەڕ دەهێنن)؟

(٧) ئێمە پێش تۆ کەسانی ترمان رەوانە نەکردووە، جگە لە پیاوانێک (کە هەڵمانبژاردوون)، وەحی و نیگایان بۆ رەوانە دەکەین، دە بپرسن لە خاوەنی کتێبەکانی پێشوو ئەگەر ئێوە ئەم راستیانە نازانن.

(٨) ئێمە وەنەبێت ئەو پێغەمبەرانەمان لە پەیکەرو لاشەیەک دروست کردبێت کە خواردن نەخۆن و ژیانی هەمیشەیی‌شمان پێ نەبەخشیوون.

(٩) لەوەودوا بەڵێنی خۆمانمان بۆ بردوونەتە سەر، جا رزگارمان کردوون لەگەڵ ئەوانەدا کە دەمانەوێت و (باوەڕیان هێناوە) سەرکەش و لە سنوور دەرچووەکانیشمان لەناو بردووە.

(١٠) سوێند بەخوا بێگومان ئێمە کتێبێکمان رەوانەکردووە بۆتان کە یاداوەریە و سەربەرزی ئێوە لە شوێنکەوتنیایەتی، ئایا ئەوە بیروهۆشتان ناخەنەکارو ژیرنابن؟

وَكَمْ قَصَمْنَا مِن قَرْيَةٍ كَانَتْ ظَالِمَةً وَأَنشَأْنَا بَعْدَهَا قَوْمًا
ءَاخَرِينَ ﴿١١﴾ فَلَمَّآ أَحَسُّوا۟ بَأْسَنَآ إِذَا هُم مِّنْهَا يَرْكُضُونَ ﴿١٢﴾
لَا تَرْكُضُوا۟ وَٱرْجِعُوٓا۟ إِلَىٰ مَآ أُتْرِفْتُمْ فِيهِ وَمَسَٰكِنِكُمْ لَعَلَّكُمْ
تُسْـَٔلُونَ ﴿١٣﴾ قَالُوا۟ يَٰوَيْلَنَآ إِنَّا كُنَّا ظَٰلِمِينَ ﴿١٤﴾ فَمَا زَالَت تِّلْكَ
دَعْوَىٰهُمْ حَتَّىٰ جَعَلْنَٰهُمْ حَصِيدًا خَٰمِدِينَ ﴿١٥﴾ وَمَا خَلَقْنَا
ٱلسَّمَآءَ وَٱلْأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَا لَٰعِبِينَ ﴿١٦﴾ لَوْ أَرَدْنَآ أَن نَّتَّخِذَ لَهْوًا
لَّٱتَّخَذْنَٰهُ مِن لَّدُنَّآ إِن كُنَّا فَٰعِلِينَ ﴿١٧﴾ بَلْ نَقْذِفُ بِٱلْحَقِّ
عَلَى ٱلْبَٰطِلِ فَيَدْمَغُهُۥ فَإِذَا هُوَ زَاهِقٌ وَلَكُمُ ٱلْوَيْلُ مِمَّا تَصِفُونَ
﴿١٨﴾ وَلَهُۥ مَن فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَمَنْ عِندَهُۥ لَا يَسْتَكْبِرُونَ
عَنْ عِبَادَتِهِۦ وَلَا يَسْتَحْسِرُونَ ﴿١٩﴾ يُسَبِّحُونَ ٱلَّيْلَ وَٱلنَّهَارَ
لَا يَفْتُرُونَ ﴿٢٠﴾ أَمِ ٱتَّخَذُوٓا۟ ءَالِهَةً مِّنَ ٱلْأَرْضِ هُمْ يُنشِرُونَ
﴿٢١﴾ لَوْ كَانَ فِيهِمَآ ءَالِهَةٌ إِلَّا ٱللَّهُ لَفَسَدَتَا فَسُبْحَٰنَ ٱللَّهِ رَبِّ ٱلْعَرْشِ
عَمَّا يَصِفُونَ ﴿٢٢﴾ لَا يُسْـَٔلُ عَمَّا يَفْعَلُ وَهُمْ يُسْـَٔلُونَ ﴿٢٣﴾ أَمِ
ٱتَّخَذُوا۟ مِن دُونِهِۦٓ ءَالِهَةً قُلْ هَاتُوا۟ بُرْهَٰنَكُمْ هَٰذَا ذِكْرُ مَن مَّعِىَ
وَذِكْرُ مَن قَبْلِى بَلْ أَكْثَرُهُمْ لَا يَعْلَمُونَ ٱلْحَقَّ فَهُم مُّعْرِضُونَ ﴿٢٤﴾

(١١) چەندەها شارو شارۆچکەمان کاول کرد کە خەڵکەکەی ستەمکار بوون و بەدوایاندا گەلانی ترمان هێناوەتە مەیدانەوە.

(١٢) جاکاتێک ئەو خوانەناسانە هەستیان کردووە کە تۆڵە و سزای ئێمە بەرەو روویان هاتووە و نزیکە یەخەیان بگرێت، ئەوە دەست بەجێ رایانکردووە لێی و سەریان لێشێواوە.

(١٣) (ئەوسا بەگاڵتە پێکردنەوە پێیان وتراوە) رامەکەن و بگەڕێنەوە بۆ ئەو رابواردنە و بۆ ئەو ماڵ وحاڵەی کە تیایدا دەژیان، بۆ ئەوەی پرس و راتان پێ بکرێت و کارێک یان ئیشێک چاوەڕێتان بکات!!

(١٤) (ئەوسا بە دەم راکردنەوە) دەیانوت: هاوار بۆ ئێمە بەڕاستی ئێمە ستەمکار بووین.

(١٥) جا بەردەوام هەر ئەوە قسەیانە، هەتا هەموویانمان دروێنە و خامۆش کرد.

(١٦) ئێمە ئاسمان و زەوی، هەرچیش لە نێوانیاندایە بەگاڵتە (بێ مەبەست) دورستمان نەکردووە.

(١٧) ئەگەر بمانویستایە یاری و گەمەیەک بسازێنین، لەلایەن خۆمانەوە دەمانسازاند، ئەگەر بڕیار بێت کاری وا بکەین...

(١٨) (جا ئەوە لە ئێمە ناوەشێتەوە) بەڵکو حەق دەماڵین بەسەر بەتاڵ و ناحەقیداو دەست بەجێ داغانی دەکەین، هاوارو واوەیلا لە ئێوە، بۆ ئەو بوختان و قسە نابەجێیانەی کە دەیکەن.

(١٩) هەرچی لە ئاسمانەکان و زەویدایە هەر خوا خاوەنیانە و لە خزمەتی ئەودان، بێگومان ئەو فریشتانەی کە لە خزمەتیدان، خۆیان بەگەورە نازانن لە پەرستنیدا و هەرگیز ماندوو بێ تاقەت و بێزار نابن لە ستایشی ئەو زاتە.

(٢٠) (بەردەوام) بە شەو و بە رۆژ تەسبیحات و ستایشی دەکەن و لەکاتێکدا ساردبوونەوەش روویان تێناکات.

(٢١) ئایا خەڵکی نالەبار پەرستراوی ساختەیان بڕیارداوە لە زەویدا و ئەو پەرستراوانە دەتوانن ژیان ببەخشن؟

(٢٢) ئەگەر لە هەردووکیاندا (لە ئاسمان و زەویدا) چەند خوایەکی تر هەبوایە غەیری (ﷲ)، ئەوە کاول و وێران دەبوون و تێک دەچوون بەسەریەکدا، پاکی و بێگەردی بۆ خوا کە پەروەردگاری عەرشە، لەو باس و خواسانەدا (کە خوانەناسان) دەیڵێن (هاوەڵ بۆ ئەو زاتە بڕیار دەدەن).

(٢٣) پرسیار ناکرێت لەوەی کە خوا دەیکات، لەکاتێکدا ئەوان پرسیاریان لێ دەکرێت و موحاسەبە دەکرێن.

(٢٤) ئایا ئەوانە چەند خوایەکی تریان لەجیاتی پەروەردگار بۆ خۆیان رەخساندووە؟! (یاخود خۆیان دەخەڵەتێنن و گێلن؟!) ئەی پێغەمبەر ﷺ پێیان بڵێ: بەڵگەتان بهێنن لەسەر ئەو بیروباوەڕەتان، من دڵنیام کە ئەم قورئانە یادخەرەوەیە، بۆ ئەوانەی کە هاوەڵی منن و رێبازی منیان گرتۆتەبەر، هەروەها لە بەسەرهاتی پێغەمبەران و قەومەکانی پێش منیش دەدوێت، بەڵام زۆربەی خەڵکی حەق و حەقیقەت ناناسن و دژایەتی دەکەن و رووی لێ وەردەچەرخێنن.

وَمَآ أَرۡسَلۡنَا مِن قَبۡلِكَ مِن رَّسُولٍ إِلَّا نُوحِيٓ إِلَيۡهِ أَنَّهُۥ لَآ إِلَٰهَ إِلَّآ أَنَا۠ فَٱعۡبُدُونِ ﴿٢٥﴾ وَقَالُواْ ٱتَّخَذَ ٱلرَّحۡمَٰنُ وَلَدٗاۗ سُبۡحَٰنَهُۥۚ بَلۡ عِبَادٞ مُّكۡرَمُونَ ﴿٢٦﴾ لَا يَسۡبِقُونَهُۥ بِٱلۡقَوۡلِ وَهُم بِأَمۡرِهِۦ يَعۡمَلُونَ ﴿٢٧﴾ يَعۡلَمُ مَا بَيۡنَ أَيۡدِيهِمۡ وَمَا خَلۡفَهُمۡ وَلَا يَشۡفَعُونَ إِلَّا لِمَنِ ٱرۡتَضَىٰ وَهُم مِّنۡ خَشۡيَتِهِۦ مُشۡفِقُونَ ﴿٢٨﴾ ۞ وَمَن يَقُلۡ مِنۡهُمۡ إِنِّيٓ إِلَٰهٞ مِّن دُونِهِۦ فَذَٰلِكَ نَجۡزِيهِ جَهَنَّمَۚ كَذَٰلِكَ نَجۡزِي ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٢٩﴾ أَوَلَمۡ يَرَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ أَنَّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَ كَانَتَا رَتۡقٗا فَفَتَقۡنَٰهُمَاۖ وَجَعَلۡنَا مِنَ ٱلۡمَآءِ كُلَّ شَيۡءٍ حَيٍّۚ أَفَلَا يُؤۡمِنُونَ ﴿٣٠﴾ وَجَعَلۡنَا فِي ٱلۡأَرۡضِ رَوَٰسِيَ أَن تَمِيدَ بِهِمۡ وَجَعَلۡنَا فِيهَا فِجَاجٗا سُبُلٗا لَّعَلَّهُمۡ يَهۡتَدُونَ ﴿٣١﴾ وَجَعَلۡنَا ٱلسَّمَآءَ سَقۡفٗا مَّحۡفُوظٗاۖ وَهُمۡ عَنۡ ءَايَٰتِهَا مُعۡرِضُونَ ﴿٣٢﴾ وَهُوَ ٱلَّذِي خَلَقَ ٱلَّيۡلَ وَٱلنَّهَارَ وَٱلشَّمۡسَ وَٱلۡقَمَرَۖ كُلّٞ فِي فَلَكٖ يَسۡبَحُونَ ﴿٣٣﴾ وَمَا جَعَلۡنَا لِبَشَرٖ مِّن قَبۡلِكَ ٱلۡخُلۡدَۖ أَفَإِيْن مِّتَّ فَهُمُ ٱلۡخَٰلِدُونَ ﴿٣٤﴾ كُلُّ نَفۡسٖ ذَآئِقَةُ ٱلۡمَوۡتِۗ وَنَبۡلُوكُم بِٱلشَّرِّ وَٱلۡخَيۡرِ فِتۡنَةٗۖ وَإِلَيۡنَا تُرۡجَعُونَ ﴿٣٥﴾



(٢٥) ئێمە پێش تۆ هیچ پێغەمبەرێکمان رەوانە نەکردووە، کە وەحیمان بۆ نەناردبێت بەوەی کە: بێگومان هیچ خوایەک نیە جگە لە من و دەبێت هەر من بپەرستن.

(٢٦) خوانەناسان دەیانوت: خوای میهرەبان کوڕی بۆ خۆی بڕیارداوە (فریشتەکان رۆڵەی ئەون)، پاکی و بێگەردی بۆ ئەو زاتەیە، بەڵکو ئەوانە بەندەی ڕێزداری ئەون.

(٢٧) (ئەو فریشتانە ئەوەندە رەوشت بەرزن) هەرگیز (نافەرمانی ناکەن و) قسە لەقسەیدا ناکەن و لەگوفتاردا پێشی ناکەون، ئەوانە بەفەرمانی ئەو دەجولێنەوە و فەرمانی ئەو جێبەجێ دەکەن.

(٢٨) هەر خوا دەزانێت ئەو خەڵکە لە رابوردوودا چیان ئەنجامداوە و لە داهاتووشدا چی ئەنجام دەدەن (دنیا و قیامەت، رابوردوو داهاتوو، بۆ ئەو زاتە چوونیەکە)، فریشتەکانیش تکاکار نابن تەنها بۆ ئەو کەسانە نەبێت خوا پێی رازییە و ئەو فریشتانە لەترسی ئەو زاتە ناوێرن هیچ سەرپێچیەک ئەنجام بدەن.

(٢٩) خۆ ئەگەر یەکێک لە فریشتەکان (لە خۆی غەرڕا بێت) بڵێت: بەڕاستی منیش خوام بێجگە لەو، ئەوە پاداشتی دەدەینەوە بە دۆزەخ، هەر بەو شێوەیە پاداشتی ستەمکاران و یاخیەکان دەدەینەوە

(٣٠) ئایا ئەوانەی بێ باوەڕ بوون ئەیانبینیوە و بۆیان روون نەبۆتەوە بەڕاستی ئاسمانەکان و زەوی یەک پارچە بوون لەوەودوا لێکمان جیاکردنەوە (کە ئەمە ئاماژەیە بۆ ئەوەی کە ئەم راستەقینە زانستیە لەلایەن ئەوانەوە پەی پێ دەبرێت)، لە ئاویش هەموو شتێکی زیندوومان فەراهەم هێناوە (ئاو، زۆربەی پێکهاتەی لەشی ئادەمیزاد و زیندەوەران و رووەک پێکدەهێنێت)، ئایا ئەوانە هەر باوەڕ ناهێنن (بەو راستیانە و بەو دەسەڵاتە بێ سنوورەی ئێمە)؟!

(٣١) لەزەویشدا کەژو کێوەکانمان چەسپاندووە، تا لاسەنگ نەبێت و لار نەبێتەوە و هەڵیان نەگێڕێتەوە، لەلاپاڵی چیاکان و لە دۆڵەکاندا ڕێگاوبانی فراوانمان سازاندووە، بۆ ئەوەی خەڵکی ژیان بۆ خۆیان دابین بکەن و هەروەها ڕێیان لە گەنجینە و نازو نیعمەتە شاراوەکان بکەوێت.

(٣٢) ئێمە ئاسمانمان کردووە بە سەقفێکی پارێزراو، کەچی ئەوانە روو وەردەگێڕن لە هەموو نیشانە و بەڵگەکانی ئاسمان.

(٣٣) هەر ئەو زاتەیە کە شەوو رۆژی بەدیهێناوە، خۆرو مانگیشی دروست کردووە، هەریەکەیان لە خولگەیەکدا دەسوڕێنەوە (زەوی بەدەوری خۆردا و مانگیش بەدەوری زەویدا).

(٣٤) ئێمە پێش تۆ ژیانی هەمیشەیی و نەمریمان بەهیچ کەسێک نەبەخشیوە، جا ئایا ئەگەر تۆ بمریت، (دوای مەرگی تۆ) ئەوە ئەو خەڵکە ژیانی هەمیشەیی دەبەنەسەرو نامرن؟!

(٣٥) هەموو کەسێک دەبێت مردن بچێژێت و شەرابی مەرگ بنۆشێت، بێگومان ئێمە ئێوە تاقیدەکەینەوە بە شەڕو ناخۆشی و بەڵاو بەخێرو خۆشی و دارایی و توانایی، سەرەنجام هەر بۆ لای ئێمە دەهێنرێنەوە (تا پاداشتتان بدەینەوە).

وَإِذَا رَءَاكَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ إِن يَتَّخِذُونَكَ إِلَّا هُزُوًا أَهَـٰذَا ٱلَّذِى يَذْكُرُ ءَالِهَتَكُمْ وَهُم بِذِكْرِ ٱلرَّحْمَـٰنِ هُمْ كَـٰفِرُونَ ﴿٣٦﴾ خُلِقَ ٱلْإِنسَـٰنُ مِنْ عَجَلٍ سَأُوْرِيكُمْ ءَايَـٰتِى فَلَا تَسْتَعْجِلُونِ ﴿٣٧﴾ وَيَقُولُونَ مَتَىٰ هَـٰذَا ٱلْوَعْدُ إِن كُنتُمْ صَـٰدِقِينَ ﴿٣٨﴾ لَوْ يَعْلَمُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ حِينَ لَا يَكُفُّونَ عَن وُجُوهِهِمُ ٱلنَّارَ وَلَا عَن ظُهُورِهِمْ وَلَا هُمْ يُنصَرُونَ ﴿٣٩﴾ بَلْ تَأْتِيهِم بَغْتَةً فَتَبْهَتُهُمْ فَلَا يَسْتَطِيعُونَ رَدَّهَا وَلَا هُمْ يُنظَرُونَ ﴿٤٠﴾ وَلَقَدِ ٱسْتُهْزِئَ بِرُسُلٍ مِّن قَبْلِكَ فَحَاقَ بِٱلَّذِينَ سَخِرُواْ مِنْهُم مَّا كَانُواْ بِهِۦ يَسْتَهْزِءُونَ ﴿٤١﴾ قُلْ مَن يَكْلَؤُكُم بِٱلَّيْلِ وَٱلنَّهَارِ مِنَ ٱلرَّحْمَـٰنِ بَلْ هُمْ عَن ذِكْرِ رَبِّهِم مُّعْرِضُونَ ﴿٤٢﴾ أَمْ لَهُمْ ءَالِهَةٌ تَمْنَعُهُم مِّن دُونِنَا لَا يَسْتَطِيعُونَ نَصْرَ أَنفُسِهِمْ وَلَا هُم مِّنَّا يُصْحَبُونَ ﴿٤٣﴾ بَلْ مَتَّعْنَا هَـٰٓؤُلَآءِ وَءَابَآءَهُمْ حَتَّىٰ طَالَ عَلَيْهِمُ ٱلْعُمُرُ أَفَلَا يَرَوْنَ أَنَّا نَأْتِى ٱلْأَرْضَ نَنقُصُهَا مِنْ أَطْرَافِهَآ أَفَهُمُ ٱلْغَـٰلِبُونَ ﴿٤٤﴾

(٣٦) ئـەی پێغەمبـەر ﷺ کـاتێـک ئەوانـەی بێ باوەڕ بوون تۆ دەبینن، هیچ کارێکیان لە دەست نایەت لەگەڵ تۆی بکەن جگە لـە گاڵتـەو گاڵتـە جـاڕیـی، (جا بەیەکتر دەڵێن): ئا ئەمەیە باسی خواکانتان دەکات؟! لـەکاتێکدا ئـەوان هەمیشـە بێ باوەڕن بە قورئانی خوای میهرەبان.

(٣٧) ئەوەندە ئینسان بە پەلەو تاڵوکەیە، (هەر دەڵێیت) لـە پەلـەو تاڵوکـە دروسـتکراوە، لـە ئـاییندەدا مـن نیشـانە و بەڵگـەکانی خۆمتـان نیشان دەدەم، جا پەلەم لێ مەکەن.

(٣٨) خوانەناسان دەڵێن: باشە، کەی ئەو بەڵێنە دێتە دی ئەگەر ئێوە راستگۆن؟

(٣٩) ئەگەر بێ باوەڕان هـەواڵی ئـەو رۆژەیـان بزانیایە (کە بەرپێوەیـە و نزیکـە و دەخرێنـە نـاو ئاگری دۆزەخەوە)، کاتێک ناتوانن بڵێسەی ئاگر لـە دەم و چـاو و رووخسـارو لـە پشـتیان دوور بخەنەوە، بەراستی ئەوانە سەرکەتوو رزگار نـابن (ئەوانە نەگاڵتەیان دەکردو نە بێباوەڕ دەبـوون و نەپەلەیان دەکرد).

(٤٠) بەڵکـو قیـامەت کتوپڕ یەخەیان دەگرێـت و سەرسام و ریسوایان دەکات، ئەوسا ناتوانن بەرەنگاری بوەستن و بیگێڕنەوە، مۆڵەتیشیان نادرێت.

(٤١) (ئەی پێغەمبەر ﷺ) سوێند بەخوا بێگومان پێش تۆ گاڵتە کراوە بەپێغەمبەرانی تریـش، ئەوسـا ئـەوەی ئـەوان گاڵتەیان پێدەکرد، یەخەی پێگرتن و بەهۆی ئەوانەیانەوە گاڵتەیان کرد.

(٤٢) پێیان بڵێ: کێ دەتوانێت ئێوە بپارێزێت لە شـەوو لـە رۆژدا لـە سزاو تۆڵـەی خـوای میـهرەبان، کـەچی لەگـەڵ ئەوەشدا ئەوانە هەمیشە روو وەرگێڕن لە یادی پەروەردگاریان.

(٤٣) یان ئەو بێباوەڕانە چەند خوایەکیان هەیە کە دەتوانن لە سزامان رزگاریان بکات جگەلە ئێمـە؟! (ئـەو کۆلکـە خوایانە) نەدەتوانن خۆیان رزگار بکەن و خۆیان سەربخەن، نە پەنا دەدرێن لەلایەن ئێمەوە و نەکۆمـەکیان دەکرێت.

(٤٤) ئێمە (بەپەلە تۆڵەناسێنین) بەڵکو ئەوانە خۆیان و باوو باپیرانیان لـە نـازو نیعمـەتی دنیـا بـەهرەوەر کـردووە، هەتـا تەمەنیـان درێژ بـۆتـەوە، جـائـایـا ئـەوانە نابینن و نـازانن کـە بەراسـتی ئێمـە وردە وردە دێـین و دەسـەڵاتیان لـەملاو لای ولاتیـانـدا کـەم دەکەینـەوە، (کـاتێک ئوممـەتی ئیسلام شایسـتە دەبێت، خوای باڵادەست دەسـەڵاتی رۆژهەلات و رۆژئاوا کەم دەکاتەوە) جا ئایا ئەو بێباوەڕانە هەمیشە سەرکەوتوو و زاڵن؟!

قُلْ إِنَّمَآ أُنذِرُكُم بِٱلْوَحْىِ ۚ وَلَا يَسْمَعُ ٱلصُّمُّ ٱلدُّعَآءَ إِذَا مَا يُنذَرُونَ ﴿٤٥﴾ وَلَئِن مَّسَّتْهُمْ نَفْحَةٌ مِّنْ عَذَابِ رَبِّكَ لَيَقُولُنَّ يَٰوَيْلَنَآ إِنَّا كُنَّا ظَٰلِمِينَ ﴿٤٦﴾ وَنَضَعُ ٱلْمَوَٰزِينَ ٱلْقِسْطَ لِيَوْمِ ٱلْقِيَٰمَةِ فَلَا تُظْلَمُ نَفْسٌ شَيْـًٔا ۖ وَإِن كَانَ مِثْقَالَ حَبَّةٍ مِّنْ خَرْدَلٍ أَتَيْنَا بِهَا ۗ وَكَفَىٰ بِنَا حَٰسِبِينَ ﴿٤٧﴾ وَلَقَدْ ءَاتَيْنَا مُوسَىٰ وَهَٰرُونَ ٱلْفُرْقَانَ وَضِيَآءً وَذِكْرًا لِّلْمُتَّقِينَ ﴿٤٨﴾ ٱلَّذِينَ يَخْشَوْنَ رَبَّهُم بِٱلْغَيْبِ وَهُم مِّنَ ٱلسَّاعَةِ مُشْفِقُونَ ﴿٤٩﴾ وَهَٰذَا ذِكْرٌ مُّبَارَكٌ أَنزَلْنَٰهُ ۚ أَفَأَنتُمْ لَهُۥ مُنكِرُونَ ﴿٥٠﴾ ۞ وَلَقَدْ ءَاتَيْنَآ إِبْرَٰهِيمَ رُشْدَهُۥ مِن قَبْلُ وَكُنَّا بِهِۦ عَٰلِمِينَ ﴿٥١﴾ إِذْ قَالَ لِأَبِيهِ وَقَوْمِهِۦ مَا هَٰذِهِ ٱلتَّمَاثِيلُ ٱلَّتِىٓ أَنتُمْ لَهَا عَٰكِفُونَ ﴿٥٢﴾ قَالُوا۟ وَجَدْنَآ ءَابَآءَنَا لَهَا عَٰبِدِينَ ﴿٥٣﴾ قَالَ لَقَدْ كُنتُمْ أَنتُمْ وَءَابَآؤُكُمْ فِى ضَلَٰلٍ مُّبِينٍ ﴿٥٤﴾ قَالُوٓا۟ أَجِئْتَنَا بِٱلْحَقِّ أَمْ أَنتَ مِنَ ٱللَّٰعِبِينَ ﴿٥٥﴾ قَالَ بَل رَّبُّكُمْ رَبُّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ٱلَّذِى فَطَرَهُنَّ وَأَنَا۠ عَلَىٰ ذَٰلِكُم مِّنَ ٱلشَّٰهِدِينَ ﴿٥٦﴾ وَتَٱللَّهِ لَأَكِيدَنَّ أَصْنَٰمَكُم بَعْدَ أَن تُوَلُّوا۟ مُدْبِرِينَ ﴿٥٧﴾

(٤٥) ئەی پێغەمبەر ﷺ پێیان بڵێ: بەڕاستی من تەنها لە ڕێگەی وەحی و نیگاوە ئێوە بێدار دەکەمەوە، کەسانێکیش هەن کەڕن لە ئاستی حەقدا و سەدای پەیامی خوا نابیستن کاتێک بێدار دەکرێنەوە.

(٤٦) سوێند بەخوا ئەگەر کەمێک لە هاڵاوی سزای پەروەردگارت روویان تێ بکات و لێیان بدات، ئەوە خوانەناسان بەکوڵ دەڵێن: هاوارو ئاهو ناڵە بۆ ئێمە، بەڕاستی ئێمە کەسانێکی ستەمکار بووین.

(٤٧) ئێمە پێوەر و تەرازووەکانی دادپەروەری لە رۆژی قیامەتدا دادەنێین، جا هیچ کەس بە هیچ شێوەیەک ستەمی لێ ناکرێت، ئەگەر بە قەدەر تۆوە خەرتەلەیەک (کە زۆر بچووک و وردە، کارێکی چاک یان خراپی ئەنجام دابێت) دەیهێنینە مەیدان، جا ئەوەندە بەسە بۆ ئێمە کە ئاوا بە وردی حساب و لێپرسینەوە ئەنجام دەدەین.

(٤٨) سوێند بە خوا بێگومان ئێمە بە موساو هاروون کتێبی تەوراتمان بەخشی کە جیاکەرەوەی حەق و بەتاڵە، هەروەها رووناکی و یادخەرەوەشە بۆ پارێزکاران...

(٤٩) ئەوانەن لە پەروەردگاریان دەترسن لە کاتێکدا کە کەس دیار نیە و پەروەردگاریش لێیان پەنهانە، هەروەها ئەوانە لە قیامەت و لێ پرسینەوە بیمیان هەیە (بێگومان ئەوانە لە قیامەتدا دڵنیا و ئاسوودە و دڵخۆشن).

(٥٠) جا ئەم قورئانەش یادخەرەوەیەکی موبارەک و بەفەڕ و پیرۆزە دامان بەزاندووە، جا ئایا ئێوە خۆتانی لێ وێڵ دەکەن و نایناسن؟!

(٥١) سوێند بەخوا بەڕاستی ئێمە ژیری و هۆشمەندیمان پێشتر بەئیبراهیم بەخشی، ئێمە چاک ئەومان دەناسی.

(٥٢) کاتێک بە باوک و قەومەکەی دەوت: ئەم بتانە چیە؟! ئێوە هەمیشە بەدەوریدا دێن و دەیانپەرستن!

(٥٣) لە وەڵامدا (تەنها بەڵگەیان ئەوە بوو، کە) وتیان: ئێمە باوو باپیرانمان بینیووە ئەمانەیان پەرستووە.

(٥٤) ئیبراهیم وتی: بەڕاستی ئێوە و باوو باپیرانی ئێوە لە گومڕاییەکی ئاشکرادا بوون.

(٥٥) خەڵکەکە وتیان: بەڕاست، تۆ حەقیقەتت بۆ ئێمە هێناوە یان گاڵتە دەکەیت؟!

(٥٦) ئیبراهیم وتی: (من گاڵتە ناکەم) بەڵکو دەمەوێت تێتان بگەیەنم کە پەروەردگارتان پەروەردگاری ئاسمانەکان و زەویە و کە بەدی هێناون و من لەسەر ئەو بیروباوەڕە لە شایەت و ئاگاکانم.

(٥٧) ئینجا ئیبراهیم لەبەرخۆیەوە سوێندی خوارد و وتی: بەخوا نەخشەیەک دەکێشم و داوێک دەنێمەوە بۆ بتەکانتان دوای ئەوەی ئێوە بەجێتان هێشتن و پشتتان هەڵکرد.

فَجَعَلَهُمْ جُذَٰذًا إِلَّا كَبِيرًا لَّهُمْ لَعَلَّهُمْ إِلَيْهِ يَرْجِعُونَ ﴿٥٨﴾ قَالُوا مَن فَعَلَ هَٰذَا بِآلِهَتِنَا إِنَّهُ لَمِنَ الظَّالِمِينَ ﴿٥٩﴾ قَالُوا سَمِعْنَا فَتًى يَذْكُرُهُمْ يُقَالُ لَهُ إِبْرَاهِيمُ ﴿٦٠﴾ قَالُوا فَأْتُوا بِهِ عَلَىٰ أَعْيُنِ النَّاسِ لَعَلَّهُمْ يَشْهَدُونَ ﴿٦١﴾ قَالُوا أَأَنتَ فَعَلْتَ هَٰذَا بِآلِهَتِنَا يَا إِبْرَاهِيمُ ﴿٦٢﴾ قَالَ بَلْ فَعَلَهُ كَبِيرُهُمْ هَٰذَا فَاسْأَلُوهُمْ إِن كَانُوا يَنطِقُونَ ﴿٦٣﴾ فَرَجَعُوا إِلَىٰ أَنفُسِهِمْ فَقَالُوا إِنَّكُمْ أَنتُمُ الظَّالِمُونَ ﴿٦٤﴾ ثُمَّ نُكِسُوا عَلَىٰ رُءُوسِهِمْ لَقَدْ عَلِمْتَ مَا هَٰؤُلَاءِ يَنطِقُونَ ﴿٦٥﴾ قَالَ أَفَتَعْبُدُونَ مِن دُونِ اللَّهِ مَا لَا يَنفَعُكُمْ شَيْئًا وَلَا يَضُرُّكُمْ ﴿٦٦﴾ أُفٍّ لَّكُمْ وَلِمَا تَعْبُدُونَ مِن دُونِ اللَّهِ أَفَلَا تَعْقِلُونَ ﴿٦٧﴾ قَالُوا حَرِّقُوهُ وَانصُرُوا آلِهَتَكُمْ إِن كُنتُمْ فَاعِلِينَ ﴿٦٨﴾ قُلْنَا يَا نَارُ كُونِي بَرْدًا وَسَلَامًا عَلَىٰ إِبْرَاهِيمَ ﴿٦٩﴾ وَأَرَادُوا بِهِ كَيْدًا فَجَعَلْنَاهُمُ الْأَخْسَرِينَ ﴿٧٠﴾ وَنَجَّيْنَاهُ وَلُوطًا إِلَى الْأَرْضِ الَّتِي بَارَكْنَا فِيهَا لِلْعَالَمِينَ ﴿٧١﴾ وَوَهَبْنَا لَهُ إِسْحَاقَ وَيَعْقُوبَ نَافِلَةً وَكُلًّا جَعَلْنَا صَالِحِينَ ﴿٧٢﴾

(٥٨) ئینجا هەموو بتەكانی وردوخاش كرد جگە لە گەورەكەیان، بەڵكو كەگەڕانەوە (پرسیار بكەن) و ئیبراهیم راستیان بۆ روون بكاتەوە.

(٥٩) بت پەرستان (كەهاتنەوە بینیان بتەكانیان وردوخاش كراوە) وتیان: ئەوەی ئەمەی كردووە بە خواكانمان، بەڕاستی ئەوە لە ستەمكارانە!!

(٦٠) هەندێكیان وتیان: بیستوومانە لاوێك بەخراپە باسیان دەكات، پێی دەڵێن ئیبراهیم.

(٦١) وتیان: كەوابوو بیهێنن بەبەرچاوی خەڵكەوە (موحاسەبەی بكەین و لێی بكۆڵینەوە) با ئەوانیش ئاگاداربن و ببینن.

(٦٢) (ئیتر چوون ئیبراهیمیان هێناو لێیان پرسی) وتیان: باشە، ئەی ئیبراهیم ئایا تۆ ئەمەت كردووە بەخواكانمان؟!

(٦٣) ئیبراهیم وتی: (بۆچی لە من دەپرسن، خۆ بتە گەورەكە ساغ و سەلیمە) نەخێر؛ هەركاری ئەو بتە زلەیە، دە لێیان بپرسن ئەگەر قسە دەكەن و تێدەگەن!!

(٦٤) (كەمێك داچڵەكان و) لە دڵی خۆیاندا لێكیان دەدایەوە، سەرئەنجام وتیان بە خۆیان: بەڕاستی هەمیشە ئێوە ستەمكارن (ئیبراهیم راست دەكات، ئەمانە ناتوانن بەرگری لە خۆیان بكەن چۆن دەتوانن بەرگری لە ئێمە بكەن).

(٦٥) پاشان بەسەرشۆڕی پاشگەزكرانەوە بۆ بیرو باوەڕە كۆنەكەیان وتیان: بێگومان تۆ زانیووتە كە ئەوانە قسە ناكەن و تێ ناگەن!! (زۆرزان و كاربەدەستانیان چەواشەیان كردنەوە).

(٦٦) ئیبراهیم وتی: باشە، ئاخر، چۆن شتێك دەپەرستن لەجیاتی خوا كە ناتوانێت هیچ جۆرە قازانج یان زیانێكتان پێ بگەیەنێت، (تەنانەت ئەوەتە نەیانتوانی بەرگری لەخۆشیان بكەن).

(٦٧) ئۆف لە دەستان و لەو شتانەش كە لەجیاتی خوا دەیپەرستن، جا ئایا ئەوە تێناگەن و بیرو هۆشتان ناخەنەكار؟!

(٦٨) هەندێكیان وتیان: ئیبراهیم بسوتێنن و پشتیوانی لە خواكانتان بكەن، ئەگەر ئێوە شتێكتان بۆ دەكرێت.

(٦٩) (خوای گەورە دەفەرموێت، ئێمەش فەرمانمان دەركرد و) وتمان: ئەی ئاگر ساردو سەلامەت لەسەر ئیبراهیم (هەرچەندە ئاگر سووتێنەرە بەڵام بەفەرمانی خوا توانای سووتاندنی نەماو ئەگەر پەروەردگار فەرمانی بەسەلامەتی نەدایە حەزرەتی ئیبراهیم لەناو ئاگرەكەدا سەرمای دەبوو).

(٧٠) ئەوانە ویستیان پیلان بگێڕن دژی ئیبراهیم ئینجا ئێمەش ئەوانمان بە رەنجەڕۆترین كەس گێڕا.

(٧١) ئێمە ئەویش و ـ لوط ـ ی برازایشمان رزگاركرد و ناردمانن بۆ (وڵاتی شام) ئەو سەر زەمینەی كە بەرەكەتمان بەسەردا رژاندووە بۆ هەموو خەڵكی.

(٧٢) هەروەها ئێمە ئیسحاقمان بەخشی بەئیبراهیم و یەعقوبیش بەنەوەی (وەك زیادە رێزێك بۆ ئیبراهیم)، هەر یەكێك لەوانمان كردە پیاوچاك و خواناس.

وَجَعَلْنَٰهُمْ أَئِمَّةً يَهْدُونَ بِأَمْرِنَا وَأَوْحَيْنَآ إِلَيْهِمْ فِعْلَ ٱلْخَيْرَٰتِ وَإِقَامَ ٱلصَّلَوٰةِ وَإِيتَآءَ ٱلزَّكَوٰةِ ۖ وَكَانُوا۟ لَنَا عَٰبِدِينَ ﴿٧٣﴾ وَلُوطًا ءَاتَيْنَٰهُ حُكْمًا وَعِلْمًا وَنَجَّيْنَٰهُ مِنَ ٱلْقَرْيَةِ ٱلَّتِى كَانَت تَّعْمَلُ ٱلْخَبَٰٓئِثَ ۗ إِنَّهُمْ كَانُوا۟ قَوْمَ سَوْءٍ فَٰسِقِينَ ﴿٧٤﴾ وَأَدْخَلْنَٰهُ فِى رَحْمَتِنَآ ۖ إِنَّهُۥ مِنَ ٱلصَّٰلِحِينَ ﴿٧٥﴾ وَنُوحًا إِذْ نَادَىٰ مِن قَبْلُ فَٱسْتَجَبْنَا لَهُۥ فَنَجَّيْنَٰهُ وَأَهْلَهُۥ مِنَ ٱلْكَرْبِ ٱلْعَظِيمِ ﴿٧٦﴾ وَنَصَرْنَٰهُ مِنَ ٱلْقَوْمِ ٱلَّذِينَ كَذَّبُوا۟ بِـَٔايَٰتِنَآ ۚ إِنَّهُمْ كَانُوا۟ قَوْمَ سَوْءٍ فَأَغْرَقْنَٰهُمْ أَجْمَعِينَ ﴿٧٧﴾ وَدَاوُۥدَ وَسُلَيْمَٰنَ إِذْ يَحْكُمَانِ فِى ٱلْحَرْثِ إِذْ نَفَشَتْ فِيهِ غَنَمُ ٱلْقَوْمِ وَكُنَّا لِحُكْمِهِمْ شَٰهِدِينَ ﴿٧٨﴾ فَفَهَّمْنَٰهَا سُلَيْمَٰنَ ۚ وَكُلًّا ءَاتَيْنَا حُكْمًا وَعِلْمًا ۚ وَسَخَّرْنَا مَعَ دَاوُۥدَ ٱلْجِبَالَ يُسَبِّحْنَ وَٱلطَّيْرَ ۚ وَكُنَّا فَٰعِلِينَ ﴿٧٩﴾ وَعَلَّمْنَٰهُ صَنْعَةَ لَبُوسٍ لَّكُمْ لِتُحْصِنَكُم مِّنۢ بَأْسِكُمْ ۖ فَهَلْ أَنتُمْ شَٰكِرُونَ ﴿٨٠﴾ وَلِسُلَيْمَٰنَ ٱلرِّيحَ عَاصِفَةً تَجْرِى بِأَمْرِهِۦٓ إِلَى ٱلْأَرْضِ ٱلَّتِى بَٰرَكْنَا فِيهَا ۚ وَكُنَّا بِكُلِّ شَىْءٍ عَٰلِمِينَ ﴿٨١﴾

(٧٣) هەموو ئەوانیشمان کردە پێشەواو بە فەرمانی ئێمە ڕێنموویی خەڵکیان دەکردو نیگامان بۆ کردن بەئەنجامدانی کارو کردەوە چاکەکان و ڕاگرتنی نوێژ و زەکات دان، (بەڕاستی) ئەوان هەر ئێمەیان دەپەرست و هەر بەندایەتی ئێمەیان دەکرد.

(٧٤) بە لوط پێغەمبەریش حیکمەت و دانایی و زانیاریمان بەخشی و ڕزگارمان کرد لەو شارەی کردەوە پیسەکانیان تێدا ئەنجام دەدا، بێگومان ئەوانە قەومێکی نالەبارو خراپ و بەدخوو تاوانکار بوون...

(٧٥) ئێمە ئەومان خستە ژێرسایەی ڕەحمەت و میهرەبانی خۆمانەوە، بەڕاستی ئەو لە ڕیزی بەندە چاك و باشەکاندایە.

(٧٦) یادی نوح پێغەمبەریش بکەرەوە کاتێك هاناو هاواری بۆ هێنابن لەمەو پێش، جا ئێمەش نزامان گیراکردو خۆی و خێزانەکەیمان لە تەنگانە گەورەکە ڕزگارکرد...

(٧٧) سەرکەوتنیشمان پێبەخشی بەسەر ئەو قەوم و هۆزەی بەڵگەو نیشانەکانی ئێمەیان بە درۆ دەزانی و بڕوایان پێی نەبوو، چونکە بەڕاستی ئەوانیش قەومێکی نالەبارو خراپ بوون، بەگشتی نوقمی ئاوی زریانەکەمان کردن.

(٧٨) یادی داودو سلێمانیش بکەرەوە کاتێك بڕیاریاندا دەربارەی ئەو کێڵگەیە کشتوکاڵیە، کاتێك کە مەڕو ماڵاتی خەڵکی تیایدا بڵاوبوونەوە بەشەو و زیانیان بە کێڵگەکە گەیاند، ئێمەیش شایەت بووین لەسەر ئەو داوەری و بڕیارەی ئەوان.

(لە سەردەمی حوکمی حەزرەتی داوددا ڕانەمەڕێك زەوی و زاری کابرایەکی کاولکرد، کابراش چوو سکاڵای خۆی گەیاندە داود، ئەویش بڕیاریدا کە هەموو ڕانە مەڕەکە بدرێت بەخاوەن زەویەکە، بەڵام حەزرەتی سولەیمانی کوڕی ڕایەکی پەسەندتری هەبوو وتی: با بەروبومی ماڵاتەکە بدرێت بەخاوەن زەویەکە تا زیانەکەی پڕ دەکاتەوە).

(٧٩) جا ئێمە چارەسەری کێشەکەمان لە سولەیمان گەیاند، بەڵام هەریەکە (لەم باوك و کوڕە) بەهرەوەرمان کردبوو لە حیکمەت و دانایی و عیلم و زانستی، هەروەها ئێمە باڵندە و چیاکانیشمان لەگەڵ داودا ملکەچ و فەرمانبەردار کردبوو، هەمووان پێکەوە تەسبیحات و ستایشی ئێمەیان دەکرد، ئێمەش ئەوەمان کرد.

(٨٠) هەروەها ئێمە داودمان فێری دروستکردنی زرێ و قەڵغان کرد، تا لە تووندو تیژی کاتی شەڕ بتانپارێزێت، ئایا (لە بەرامبەر ئەم هەموو نازو نیعمەتانەوە) ئێوە سوپاسگوزار دەبن؟!

(٨١) بۆ سولەیمانیش بایەکی بەهێزو تیژمان ڕەخساند کە بەفەرمانی ئەو، جاروبار هاتووچۆی دەکرد بۆ ئەو زەویەی کە بەرەکەتمان بەسەردا ڕژاندبوو و ئێمە بەهەموو شتێك زانا و شارەزایین.



وَمِنَ ٱلشَّيَٰطِينِ مَن يَغُوصُونَ لَهُۥ وَيَعۡمَلُونَ عَمَلٗا دُونَ ذَٰلِكَۖ وَكُنَّا لَهُمۡ حَٰفِظِينَ ﴿٨٢﴾ ۞ وَأَيُّوبَ إِذۡ نَادَىٰ رَبَّهُۥٓ أَنِّي مَسَّنِيَ ٱلضُّرُّ وَأَنتَ أَرۡحَمُ ٱلرَّٰحِمِينَ ﴿٨٣﴾ فَٱسۡتَجَبۡنَا لَهُۥ فَكَشَفۡنَا مَا بِهِۦ مِن ضُرّٖۖ وَءَاتَيۡنَٰهُ أَهۡلَهُۥ وَمِثۡلَهُم مَّعَهُمۡ رَحۡمَةٗ مِّنۡ عِندِنَا وَذِكۡرَىٰ لِلۡعَٰبِدِينَ ﴿٨٤﴾ وَإِسۡمَٰعِيلَ وَإِدۡرِيسَ وَذَا ٱلۡكِفۡلِۖ كُلّٞ مِّنَ ٱلصَّٰبِرِينَ ﴿٨٥﴾ وَأَدۡخَلۡنَٰهُمۡ فِي رَحۡمَتِنَآۖ إِنَّهُم مِّنَ ٱلصَّٰلِحِينَ ﴿٨٦﴾ وَذَا ٱلنُّونِ إِذ ذَّهَبَ مُغَٰضِبٗا فَظَنَّ أَن لَّن نَّقۡدِرَ عَلَيۡهِ فَنَادَىٰ فِي ٱلظُّلُمَٰتِ أَن لَّآ إِلَٰهَ إِلَّآ أَنتَ سُبۡحَٰنَكَ إِنِّي كُنتُ مِنَ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٨٧﴾ فَٱسۡتَجَبۡنَا لَهُۥ وَنَجَّيۡنَٰهُ مِنَ ٱلۡغَمِّۚ وَكَذَٰلِكَ نُـۨجِي ٱلۡمُؤۡمِنِينَ ﴿٨٨﴾ وَزَكَرِيَّآ إِذۡ نَادَىٰ رَبَّهُۥ رَبِّ لَا تَذَرۡنِي فَرۡدٗا وَأَنتَ خَيۡرُ ٱلۡوَٰرِثِينَ ﴿٨٩﴾ فَٱسۡتَجَبۡنَا لَهُۥ وَوَهَبۡنَا لَهُۥ يَحۡيَىٰ وَأَصۡلَحۡنَا لَهُۥ زَوۡجَهُۥٓۚ إِنَّهُمۡ كَانُواْ يُسَٰرِعُونَ فِي ٱلۡخَيۡرَٰتِ وَيَدۡعُونَنَا رَغَبٗا وَرَهَبٗاۖ وَكَانُواْ لَنَا خَٰشِعِينَ ﴿٩٠﴾

(٨٢) لە پەریەکانیش هەندێکمان بۆ رام هێنابوو کە بچنە ناو بنی دەریاوە (تا گەوهەر و مرواری و شتی بەنرخی بۆ دەربهێنن) و جگە لەوە کاری تریشیان دەکرد (وەکو دروستکردنی کۆشک و تەلارو پەیکەرو.. هتد)و ئێمەیش چاودێریمان دەکردن (تا کارەکانیان بەچاکی ئەنجام بدەن و زیان بەخەڵک نەگەیەنن).

(٨٣) یادی - ئەیوب - یش بکە کاتێک هانا و هاواری بۆ پەروەردگاری برد (دوای ئەوەی ماوەیەکی دوورو درێژ نەخۆش کەوتبوو، جگە لەوە پێشتریش ماڵ و سامان و منداڵەکانی تیاچوو بوون) وتی: پەروەردگارا، بەڕاستی من ئازارو ناخۆشیم تووش بووە، تۆش لە هەموو کەس میهرەبانترو لە هەموو کەس دڵۆڤانتریت.

(٨٤) جا ئێمەش نزامان گیراکردو بەهاواریەوە چووین و هەموو ناخۆشی و نەخۆشیەکمان لەکۆڵ کردەوە، هەموو ماڵ و منداڵیمان پێبەخشیەوە و ئەوەندەی تریش لەگەڵیاندا (دەکرێت خوای گەورە هەر هەمان ماڵ و منداڵی پێشووی بۆ زیندوو کردبێتەوە، یاخود ئەوەی نوێی پێبەخشیبێت)، ئەوە رەحمەتێکی تایبەتی بوو لەلایەن ئێمەوە، یاداوەریشە بۆ بەندە خواپەرستەکان (کە ئەگەر ئەوانیش تووشی بەڵاو ناخۆشی بوون وەک ئەم، لەوەودوا نزایان کرد، خوای میهرەبان بەهاناو هاواری ئەوانیشەوە دەچێت).

(٨٥) یادی (إسماعیل و إدریس و ذوالکفل) یش بکەرەوە، هەریەکە لەوان (لە تاقیکردنەوە جۆراو جۆرەکاندا سەرکەوتووبوون) لە خۆگرو ئارامگران بوون.

(٨٦) ئێمە هەموویانمان خستە ژێرسایەی رەحمەت و میهرەبانی خۆمانەوە، چونکە بەڕاستی ئەوانە لە چاک و پاکانن.

(٨٧) یادی (ذوالنون)یش بکەرەوە (کە یونس پێغەمبەرە) کاتێک بە توڕەییەوە رۆیشت، گومانی وابوو کە هەرگیز دنیای لێ تەنگ ناکەینەوە (بەڵام بەپێچەوانەی گومانەکەیەوە خوا خستیە ناوسکی نەهەنگەوە)، جا لەناو تاریکایەکاندا، (تاریکای شەوو دەریا و ناوسکی نەهەنەگەکەدا) هاوارو نزای لێ بەرز بۆوە وتی: پەروەردگارا هیچ خوایەک نیە جگە لە تۆ، پاکی و بێگەردی هەر بۆ تۆیە، بەڕاستی من لە ستەمکاران بووم (کاتێک بەبێ فەرمانی تۆ قەومەکەم بەجێهێشت).

(٨٨) ئێمەش بەهانایەوە چووین و رزگارمانکرد؛ لەو غەم و پەژارەو تەنگانەیەی کە تێی کەوتبوو، بەو شێوەیەش ئیمانداران رزگار دەکەین (کاتێک کە دەکەونە تەنگانەوە و هاناو هاوار بۆ ئێمە دەهێنن).

(٨٩) یادی (زکـــریا) ش بکەرەوە کاتێک هاناو هاواری بۆ پەروەردگاری بردو وتی: پەروەردگارا؛ من بەتەنهای مەهێڵەرەوە (ئەوەیەکی چاک و پاکم پێ ببەخشە) تۆیش چاکترین زاتێکی لە پاش من و هەموو مردوویەک دەمێنیتەوە.

(٩٠) ئینجا ئێمە نزاکەیمان گیرا کردو (یـحیـی) مان پێبەخشی، هاوسەرەکەشیمان بۆ چاککرد کە منداڵی ببێ، چونکە بەڕاستی ئەوانە چالاک و گورج و گۆڵ بوون لە ئەنجامدانی هەموو خێرو چاکەیەکدا و نزای بەکوڵیان دەکرد، بەئومێدی رەحمەت و بەهەشتی ئێمە و لە دۆزەخ و خەشمی ئێمە دەترسان و ئەوان هەمیشە گەردن کەچ بوون بۆ ئێمە.

وَالَّتِي أَحْصَنَتْ فَرْجَهَا فَنَفَخْنَا فِيهَا مِن رُّوحِنَا وَجَعَلْنَاهَا وَابْنَهَا آيَةً لِّلْعَالَمِينَ ﴿٩١﴾ إِنَّ هَٰذِهِ أُمَّتُكُمْ أُمَّةً وَاحِدَةً وَأَنَا رَبُّكُمْ فَاعْبُدُونِ ﴿٩٢﴾ وَتَقَطَّعُوا أَمْرَهُم بَيْنَهُمْ ۖ كُلٌّ إِلَيْنَا رَاجِعُونَ ﴿٩٣﴾ فَمَن يَعْمَلْ مِنَ الصَّالِحَاتِ وَهُوَ مُؤْمِنٌ فَلَا كُفْرَانَ لِسَعْيِهِ وَإِنَّا لَهُ كَاتِبُونَ ﴿٩٤﴾ وَحَرَامٌ عَلَىٰ قَرْيَةٍ أَهْلَكْنَاهَا أَنَّهُمْ لَا يَرْجِعُونَ ﴿٩٥﴾ حَتَّىٰ إِذَا فُتِحَتْ يَأْجُوجُ وَمَأْجُوجُ وَهُم مِّن كُلِّ حَدَبٍ يَنسِلُونَ ﴿٩٦﴾ وَاقْتَرَبَ الْوَعْدُ الْحَقُّ فَإِذَا هِيَ شَاخِصَةٌ أَبْصَارُ الَّذِينَ كَفَرُوا يَا وَيْلَنَا قَدْ كُنَّا فِي غَفْلَةٍ مِّنْ هَٰذَا بَلْ كُنَّا ظَالِمِينَ ﴿٩٧﴾ إِنَّكُمْ وَمَا تَعْبُدُونَ مِن دُونِ اللَّهِ حَصَبُ جَهَنَّمَ أَنتُمْ لَهَا وَارِدُونَ ﴿٩٨﴾ لَوْ كَانَ هَٰؤُلَاءِ آلِهَةً مَّا وَرَدُوهَا ۖ وَكُلٌّ فِيهَا خَالِدُونَ ﴿٩٩﴾ لَهُمْ فِيهَا زَفِيرٌ وَهُمْ فِيهَا لَا يَسْمَعُونَ ﴿١٠٠﴾ إِنَّ الَّذِينَ سَبَقَتْ لَهُم مِّنَّا الْحُسْنَىٰ أُولَٰئِكَ عَنْهَا مُبْعَدُونَ ﴿١٠١﴾

(٩١) یادی (مریم) یش بکەرەوە، ئەو ئافرەتەی داوێنی خۆی بەخاوێنی راگرت، ئێمەش لەو رۆحەی خاوەنی بووین پێمان بەخشی و خۆی و کورەکەیمان کرد بە(موعجیزە) و بەڵگە بۆ هەموو خەڵکی.

(٩٢) خەڵکینە! بەراستی ئەم ئایینەی کە ئەم پێغەمبەرانە هێناویانە ئایینەکەی ئێوەیە، کە یەک ئایینە و منیش پەروەردگارتانم، تەنها من بپەرستن.

(٩٣) (لەگەڵ ئەوەشدا، لە رێبازی یەکتاناسی و ئایینی ئیسلام لایانداو) بەش بەشیان کرد لەنێوانی خۆیاندا، جۆرەها دەستەو گرۆ دروست بوو، بە مەرجێک هەر هەموشیان بۆ لای ئێمە دەگەڕێنەوە (لە دەستمان دەرناچن).

(٩٤) جا ئەوەی کارو کردەوە چاکەکان ئەنجام بدات لەکاتێکدا کە ئەوکەسە باوەڕدارە، جا ئەوە هەوڵ و کۆششەکەی پشتگوێ ناخرێت و بەزایە ناچێت بەراستی ئێمە بۆی یاداشت و تۆمار دەکەین.

(٩٥) جارێکی ترحەرامە و ئەستەمە لە دانیشتوانی هەر شارو شارۆچکەیەک کە کاولمان کردووە، بێگومان ناگەڕێنەوە...

(٩٦) هەتا ئەو کاتەی بەربەستەکەی (ذوالقرنین) لەسەر دوو تیرەی یاجوج و ماجوج دەکرێتەوە (کە ئەمەش یەکێکە لە نیشانەکانی نزیک بوونەوەی کۆتایی دنیا) و ئەوانە ئەو کاتە لە هەموو کون و کەلێنێکەوە بەلێشاو پەیدا دەبن و زۆر دەبن.

(٩٧) ئەوسا ئیتر بەڵێنی راستی نزیک دەبێتەوە و دەست پێ دەکات، ئینجا دەبینیت چاوی ئەوانەی بێباوەڕن ئەبڵەق و زەق دەبێت، (بێ پەروا دەڵێن) هاوار بۆ ئێمە، چاک غافڵ بووین لەم رۆژە، لەم سەرئەنجامە، نەک هەر ئەوە! بەڵکو ئێمە هەر ستەمکاربووین.

(٩٨) (پاشان پێیان دەوترێت) بێگومان ئێوە و ئەو شتانەی لەجیاتی خوا دەتانپەرست سووتەمەنی دۆزەخن و سەلکە بزوتی ئاگرن، دەبێت هەر بچنە ناوی و هەمیشە تێیدان.

(٩٩) (هەروەها بەهاوەڵگەران دەوترێت) ئەوانەی ئێوە دەتانپەرست ئەگەر خوا بوونایە ئاوا نەدەخرانە ناو دۆزەخەوە، بێگومان هەرهەموویان (هاوەڵگەران و پەرستراوەکانیان) لە دۆزەخدا بۆ هەمیشە دەمێننەوە.

(١٠٠) ئەوانە؛ بەهەناسەی قورس و لرخەلرخ و ئاهو ناڵەوە (ژیانی سەختی تیادا دەبەنەسەر) و مژدە و هیواو قسەیەکی خۆش نابیستن.

(١٠١) بەراستی ئەوانەی کە هەر زوو بڕیارماندوە چاکە بهێنینە رێیان (بەهۆی ئیمان و باوەڕو کردەوەی چاکیانەوە) ئەوانە دوورە پەرێز کراون لە دۆزەخەوە.

لَا يَسْمَعُونَ حَسِيسَهَا ۖ وَهُمْ فِي مَا اشْتَهَتْ أَنفُسُهُمْ خَالِدُونَ ﴿١٠٢﴾ لَا يَحْزُنُهُمُ الْفَزَعُ الْأَكْبَرُ وَتَتَلَقَّاهُمُ الْمَلَائِكَةُ هَٰذَا يَوْمُكُمُ الَّذِي كُنتُمْ تُوعَدُونَ ﴿١٠٣﴾ يَوْمَ نَطْوِي السَّمَاءَ كَطَيِّ السِّجِلِّ لِلْكُتُبِ ۚ كَمَا بَدَأْنَا أَوَّلَ خَلْقٍ نُّعِيدُهُ ۚ وَعْدًا عَلَيْنَا ۚ إِنَّا كُنَّا فَاعِلِينَ ﴿١٠٤﴾ وَلَقَدْ كَتَبْنَا فِي الزَّبُورِ مِن بَعْدِ الذِّكْرِ أَنَّ الْأَرْضَ يَرِثُهَا عِبَادِيَ الصَّالِحُونَ ﴿١٠٥﴾ إِنَّ فِي هَٰذَا لَبَلَاغًا لِّقَوْمٍ عَابِدِينَ ﴿١٠٦﴾ وَمَا أَرْسَلْنَاكَ إِلَّا رَحْمَةً لِّلْعَالَمِينَ ﴿١٠٧﴾ قُلْ إِنَّمَا يُوحَىٰ إِلَيَّ أَنَّمَا إِلَٰهُكُمْ إِلَٰهٌ وَاحِدٌ ۖ فَهَلْ أَنتُم مُّسْلِمُونَ ﴿١٠٨﴾ فَإِن تَوَلَّوْا فَقُلْ آذَنتُكُمْ عَلَىٰ سَوَاءٍ ۖ وَإِنْ أَدْرِي أَقَرِيبٌ أَم بَعِيدٌ مَّا تُوعَدُونَ ﴿١٠٩﴾ إِنَّهُ يَعْلَمُ الْجَهْرَ مِنَ الْقَوْلِ وَيَعْلَمُ مَا تَكْتُمُونَ ﴿١١٠﴾ وَإِنْ أَدْرِي لَعَلَّهُ فِتْنَةٌ لَّكُمْ وَمَتَاعٌ إِلَىٰ حِينٍ ﴿١١١﴾ قَالَ رَبِّ احْكُم بِالْحَقِّ ۗ وَرَبُّنَا الرَّحْمَٰنُ الْمُسْتَعَانُ عَلَىٰ مَا تَصِفُونَ ﴿١١٢﴾

سُورَةُ الحَجِّ

(١٠٢) قرچە قرچ و ورشە و دەنگی بڵێسەی نابیسن، (بەڵكو ئەوان لەناو نازو نیعمەتدا) كە حەزیان لێی بوو و ئارەزوویان دەكرد بۆ هەتا هەتایی دەمێنن.

(١٠٣) (ئەو بەختەوەرانە) لێقەومانی گەورە و تەنگانەی بێ سنووری (قیامەت) تووشی غەمباری و پەژارەیان ناكات، بەڵكو فریشتەكان (بە ڕووی خۆشەوە پێشوازیان لیّ دەكەن و) دەڵێن ئەمە ئەو ڕۆژەیە كەكاتی خۆی بەڵێنتان پێدەدرا (ئێوە ئیتر ڕزگارتان بوو لە تەنگانە و ناخۆشی دنیا، بۆ هەمیشە كەوتنەتە خۆشیەوە).

(١٠٤) ڕۆژێك دێت ئێمە ئاسمان دەپێچینەوە، وەكو چۆن كتێبی كراوە دادەخرێت و دەپێچرێتەوە هەروەك چۆن لە سەرەتاوە دروستمان كرد، وەك ئەوسای خۆی لیّ دەكەینەوە (بۆ ئەوەی سەرلەنوێ بەشێوەیەكی تر دروستی بكەینەوە) جا ئەوە پەیمان و بەڵێنی ئێمەیە، بێگومان ئێمە ئەو كارە ئەنجام دەدەین.

(١٠٥) سوێند بەخوا بەڕاستی ئێمە لە كتێبی زەبووردا دوای تەورات بڕیارمانداوە كە: بێگومان بەندە شیاو و چاكەكانم دەبنە خاوەنی زەوی.

(١٠٦) بەڕاستی ئا لەم باسەدا مژدەو ڕاگەیاندن بۆ كەسانی خواپەرست و بەندە ملكەچەكان.

(١٠٧) (ئەی محمد ﷺ) ئێمە تۆمان ڕەوانە نەكردووە تەنها بۆ ئەوە نەبێت كە ببیتە ڕەحمەت و بەرەكەت بۆ هەموو جیهانەكان (جیهانی ئادەمیزاد و گیاندار و ڕووەك و پەری و...هتد).

(١٠٨) (ئەی پێغەمبەر ﷺ تۆ) بڵێ: بەڕاستی من تەنها ئاگادار دەكرێم كە بێگومان خوای ئێوە هەر خوایەكی تاك و تەنهایە، ئایا ئێوە تەسلیمی ئەم بڕیارە دەبن و موسوڵمان دەبن؟!

(١٠٩) خۆ ئەگەر پشتیان هەڵكردو گوێیان نەگرت (بۆ گوفتارو بەرنامەی ڕوون و ئاشكرای تۆ، ئەوە پێیان) بڵێ: من پەیامی خوام بەیەكسانی بەهەمووتان گەیاندووە (هیچ شتێكم لەكەس نەشاردۆتەوە) من ئیتر نازانم ئەو هەڕەشەیەی كە لە ئێوە دەكرێت نزیكە یان دوورە (دەربارەی شكستی ئێوە، یان بەرپا بوونی قیامەت).

(١١٠) (دڵنیابن كە) بەڕاستی هەر ئەو زاتە خۆی دەزانێت و ئاگایە بەگوفتاری ئاشكراو هەر ئەویش دەزانێت و ئاگادارە لەوەی كە دەیشارنەوە (لە كارو كردەوەتان).

(١١١) من نازانم لەوانەیە ئەم دواخستنی تۆڵە و بەڵێنی پەروەردگارە بۆ تاقیكردنەوە و سزاتان بێت و ڕابواردنێكیش بێت تا كاتێكی دیاریكراو (لە دنیای كۆتا تەمەندا، یاخود بەڵكو بەخۆدا بچنەوە و ڕێبازی دینداری بگرنە بەر).

(١١٢) (دوای گەیاندنی پەیامی خوا و گوێ پێنەدانی خوانەناسان) پێغەمبەر ﷺ وتی: پەروەردگارا دادگەرانە لە نێوان من و ئەمانەدا داوەری بفەرموو لەسەر بنچینەی حەق و ڕاستی، پەروەردگارمان بەخشندە و میهرەبانەو داوای یارمەتی لێكراوە بۆ ئەوەی سەرمان بخات بەسەر ئەو پێناسەیەی كە ئێوە دەیكەن دەربارەی خواو پێغەمبەر و پەیامەكەی.

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

يَا أَيُّهَا النَّاسُ اتَّقُوا رَبَّكُمْ ۚ إِنَّ زَلْزَلَةَ السَّاعَةِ شَيْءٌ عَظِيمٌ ﴿١﴾ يَوْمَ تَرَوْنَهَا تَذْهَلُ كُلُّ مُرْضِعَةٍ عَمَّا أَرْضَعَتْ وَتَضَعُ كُلُّ ذَاتِ حَمْلٍ حَمْلَهَا وَتَرَى النَّاسَ سُكَارَىٰ وَمَا هُم بِسُكَارَىٰ وَلَٰكِنَّ عَذَابَ اللَّهِ شَدِيدٌ ﴿٢﴾ وَمِنَ النَّاسِ مَن يُجَادِلُ فِي اللَّهِ بِغَيْرِ عِلْمٍ وَيَتَّبِعُ كُلَّ شَيْطَانٍ مَّرِيدٍ ﴿٣﴾ كُتِبَ عَلَيْهِ أَنَّهُ مَن تَوَلَّاهُ فَأَنَّهُ يُضِلُّهُ وَيَهْدِيهِ إِلَىٰ عَذَابِ السَّعِيرِ ﴿٤﴾ يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِن كُنتُمْ فِي رَيْبٍ مِّنَ الْبَعْثِ فَإِنَّا خَلَقْنَاكُم مِّن تُرَابٍ ثُمَّ مِن نُّطْفَةٍ ثُمَّ مِنْ عَلَقَةٍ ثُمَّ مِن مُّضْغَةٍ مُّخَلَّقَةٍ وَغَيْرِ مُخَلَّقَةٍ لِّنُبَيِّنَ لَكُمْ ۚ وَنُقِرُّ فِي الْأَرْحَامِ مَا نَشَاءُ إِلَىٰ أَجَلٍ مُّسَمًّى ثُمَّ نُخْرِجُكُمْ طِفْلًا ثُمَّ لِتَبْلُغُوا أَشُدَّكُمْ ۖ وَمِنكُم مَّن يُتَوَفَّىٰ وَمِنكُم مَّن يُرَدُّ إِلَىٰ أَرْذَلِ الْعُمُرِ لِكَيْلَا يَعْلَمَ مِن بَعْدِ عِلْمٍ شَيْئًا ۚ وَتَرَى الْأَرْضَ هَامِدَةً فَإِذَا أَنزَلْنَا عَلَيْهَا الْمَاءَ اهْتَزَّتْ وَرَبَتْ وَأَنبَتَتْ مِن كُلِّ زَوْجٍ بَهِيجٍ ﴿٥﴾

## سورەتی (الحــج)

بەناوی خوای بەخشندە و میهرەبان

(١) ئەی خەڵکینە لە پەروەردگارتان بترسن و خۆتان لە خەشمی بپارێزن چونکە بەڕاستی زەوی لەرزەی قیامەت و کاول بوونی بوونەوەر کارەساتێکی زۆر گەورەیە و رووداوێکی سامناکە.

(٢) لەو رۆژەدا کە کارەساتەکە دەبینن، هەموو شیردەرێک لە شیرە خۆرەکەی بێئاگا دەبێت و فەرامۆشی دەکات، هەموو سکپڕو دوو گیانێکیش کۆرپەلەکەی دادەنێت، خەڵکی دەبینیت، وەکو سەرخۆشن، لە راستیدا سەرخۆشیش نین، بەڵکو سزای خوایی زۆر سەخت و سامناکە و سەری لێ شێواندوون.

(٣) هەندێ لەخەڵکی دەبینیت بەبێ هیچ زانستی و زانیاریەک دەربارەی (گەورەیی و دەسەلاتی) خوای پەروەردگار موجادەلە دەکەن و باس و خواس دەکەن و شوێن هەموو شەیتانێکی یاخی و سەرکەش دەکەون.

(٤) لەسەر شەیتان بڕیاردراوە، بێگومان ئەوەی شوێنی بکەوێت و بەگوێی بکات، ئەوە بەڕاستی گومڕای دەکات و رێگەی بۆ خۆش دەکات تا بەرەو سزای دۆزەخ بیبات.

(٥) ئەی خەڵکینە ئەگەر ئێوە گومانتان لە زیندوو بوونەوە هەیە، ئەوە چاک بزانن کە ئێمە سەرەتا ئێوەمان لە خاک و خۆڵ دروستکردووە، لەوەودوا (نەوەکان) لە نوتفەیەک (پەیدا بوون)، پاشان نوتفەش دەبێتە خۆهەڵواسەرێک لەناو منداڵداندا، لەوەودوا دەبێتە گۆشتپارەیەکی تەواوو سەرو سیمادار، یان ناتەواو، (هەموو ئەم شتانە دەهێنینەوە یادتان) تا بۆتان روون بکەینەوە کە ئێمە ئاوا ئێوەمان دروستکردووە و دووبارە دروستکردنەوەشتان لامان ئاسانە، ئەوەش بمانەوێت لە منداڵدانەکاندا جێگیری دەکەین، تا کاتێکی دیاریکراو، لەوەودوا بەساوایی و بەبچووکی دەرتاندەهێنین (لە سکی دایکتان) دوایی بۆ ئەوەی گەورە ببن و بگەنە ئەوپەڕی هێزو تواناتان، هەتانە دەمرێنرێت بەگەنجی، هەشتانە دەگەڕێنرێتەوە بۆ پەرپووتترنی تەمەنەکان، بۆ ئەوەی هیچ شتێک نەزانێت دوای ئەوەی جاران دەیزانی، (بەڵگەیەکی تریش لەسەر زیندووبوونەوە ئەوەیە کە ئەی ئینسان) تۆ زەویش دەبینیت ووشک و برنگە، جا کاتێک ئاوی بارانمان بەسەردا باراند، دادەچڵەکێت و دەلەرزێت و تۆوەکان چەکەرە دەکەن و رەگ و چڵ دەردەکەن و دەروێن، ئەوسا لە هەموو جۆرە گژوگیاو گوڵ و گوڵزارێکی جوان جووت دەروێنێت.

ذَٰلِكَ بِأَنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلۡحَقُّ وَأَنَّهُۥ يُحۡيِ ٱلۡمَوۡتَىٰ وَأَنَّهُۥ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٞ ﴿٦﴾ وَأَنَّ ٱلسَّاعَةَ ءَاتِيَةٞ لَّا رَيۡبَ فِيهَا وَأَنَّ ٱللَّهَ يَبۡعَثُ مَن فِي ٱلۡقُبُورِ ﴿٧﴾ وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يُجَٰدِلُ فِي ٱللَّهِ بِغَيۡرِ عِلۡمٖ وَلَا هُدٗى وَلَا كِتَٰبٖ مُّنِيرٖ ﴿٨﴾ ثَانِيَ عِطۡفِهِۦ لِيُضِلَّ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِۖ لَهُۥ فِي ٱلدُّنۡيَا خِزۡيٞۖ وَنُذِيقُهُۥ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ عَذَابَ ٱلۡحَرِيقِ ﴿٩﴾ ذَٰلِكَ بِمَا قَدَّمَتۡ يَدَاكَ وَأَنَّ ٱللَّهَ لَيۡسَ بِظَلَّٰمٖ لِّلۡعَبِيدِ ﴿١٠﴾ وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يَعۡبُدُ ٱللَّهَ عَلَىٰ حَرۡفٖۖ فَإِنۡ أَصَابَهُۥ خَيۡرٌ ٱطۡمَأَنَّ بِهِۦۖ وَإِنۡ أَصَابَتۡهُ فِتۡنَةٌ ٱنقَلَبَ عَلَىٰ وَجۡهِهِۦ خَسِرَ ٱلدُّنۡيَا وَٱلۡأٓخِرَةَۚ ذَٰلِكَ هُوَ ٱلۡخُسۡرَانُ ٱلۡمُبِينُ ﴿١١﴾ يَدۡعُواْ مِن دُونِ ٱللَّهِ مَا لَا يَضُرُّهُۥ وَمَا لَا يَنفَعُهُۥۚ ذَٰلِكَ هُوَ ٱلضَّلَٰلُ ٱلۡبَعِيدُ ﴿١٢﴾ يَدۡعُواْ لَمَن ضَرُّهُۥٓ أَقۡرَبُ مِن نَّفۡعِهِۦۚ لَبِئۡسَ ٱلۡمَوۡلَىٰ وَلَبِئۡسَ ٱلۡعَشِيرُ ﴿١٣﴾ إِنَّ ٱللَّهَ يُدۡخِلُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ جَنَّٰتٖ تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُۚ إِنَّ ٱللَّهَ يَفۡعَلُ مَا يُرِيدُ ﴿١٤﴾ مَن كَانَ يَظُنُّ أَن لَّن يَنصُرَهُ ٱللَّهُ فِي ٱلدُّنۡيَا وَٱلۡأٓخِرَةِ فَلۡيَمۡدُدۡ بِسَبَبٍ إِلَى ٱلسَّمَآءِ ثُمَّ لۡيَقۡطَعۡ فَلۡيَنظُرۡ هَلۡ يُذۡهِبَنَّ كَيۡدُهُۥ مَا يَغِيظُ ﴿١٥﴾

(٦) (ئەم شتانەی کە باسکران) بۆ ئەوەیە کە دڵنیابن هەر خوا زاتێکی حەق و راستە، بێگومان هەر ئەویش بەئاسانی مردووان زیندوو دەکاتەوە و بەڕاستی ئەو پەروەردگارە دەسەڵاتی بەسەر هەموو شتێکدا هەیە.
(٧) بێگومان قیامەتیش هەر بەرپا دەبێت و پێش دێت و هیچ گومانی تێدا نیە و بەڕاستی ئەو خوایە هەر هەموو ئەوانەی کە لەناو گۆڕدان زیندوویان دەکاتەوە و دەیانهێنێتە دەرەوە.
(٨) هەندێک لەخەڵکی هەن موجادەلە دەربارەی زاتی خواو سیفاتە پیرۆزەکانی دەکەن دوور لە هەموو زانست و زانیاری و بۆچوون و کتێب و سەرچاوەیەکی روون و ئاشکرا.
(٩) (هەندێک لەو جۆرە کەسانە) روو وەردەگێڕێت و شان هەڵدەتەکێنێت و فیز دەکات تا خۆی و خەڵکی لە رێبازی خوا وەربگێڕێت، ئەو جۆرە کەسانە هەر لە دنیادا ریسوایی و خەجاڵەتی و سەرشۆڕی دەیانگرێتەوە، لە رۆژی قیامەتیشدا سزای سوتێنەری پێ دەچێژین.
(١٠) (ئەوسا پێی دەوترێت) ئەم سەرئەنجامە دەستپێشکەری خۆتە تووشت هاتۆتەوە، بێگومانیش خوا بەهیچ جۆرە ستەم لە بەندەکانی ناکات.
(١١) هەندێک لە خەڵکی هەیە تەنها لە یەک حاڵەتدا خواپەرستی دەکات (ئەویش ئەو حاڵەتەیە کە دنیا بەدڵی ئەو بێت)، ئەگەر تووشی خێرو خۆشی بوو دڵی پێی خۆشە، خۆ ئەگەر تووشی تاقیکردنەوەیەک هات، سواری سەری خۆی دەبێت و هەڵدەگەڕێتەوە، ئا بەو حاڵەتەی دنیا و قیامەت لە دەست خۆی دەدات و زەرەرمەندی هەردوو لایە و هەر ئەوەشە خەسارەتمەند و زەرەرمەندی روون و ئاشکرا.
(١٢) (ئەو جۆرە کەسانە) هاناو هاوار لەکەسێک دەکەن لەجیاتی خوا، یاخود پەنا بۆ کەسێک دەبەن نە زەرەرو نە قازانجی پێدەگەیەنێت، ئەو حاڵەتە گومڕایی و سەرلێشێواویەکی زۆر نابەجێ و دوورە.
(١٣) (نەفامان هاناو هاوار) لەکەسێک دەکەن کە زەرەری زیاتر و نزیکترە لە قازانجی، ئای کە چەندە یارو یاوەر و هاودەمێکی ناڕەسەن و خراپیان هەیە.
(١٤) بەڕاستی خوا ئەو کەسانەی ئیمان و باوەڕیان هێناوە و کاروکردەوە چاکەکانیان ئەنجامداوە دەخاتە باخەکانی بەهەشتەوە، چەندەها رووبار بەژێر درەختەکانیدا دەڕوات، بێگومان خوای گەورە هەرشتێکی بوێت ئەنجامی دەدات.
(١٥) ئەو کەسەی وادەزانێت و واگومان دەبات کە خوا هەرگیز سەری ناخات و پشتیوانی لێناکات، نە لەدنیادا نەلە قیامەتدا، دەبا پەتێک بە بەرزیەوە هەڵبواسێت (ملی خۆی پیادا بکات) ئینجا بیبڕێت و خۆی بخنکێنێت (یاخود کەسێک واگومان دەبات کە هەرگیز خوا پێغەمبەر ﷺ و پەیامەکەی سەرناخات لە دنیاو قیامەتدا، با بڕوا بهێنێت بەئایینێکی ئاسمانی پاشان پاشگەز بێتەوە) با تەماشا بکات و بزانێت ئەو پیلان وفێڵ و نەخشەیەی، رق و کینە و بوغزی لادەبات؟!

وَكَذَٰلِكَ أَنزَلْنَٰهُ ءَايَٰتٍۭ بَيِّنَٰتٍ وَأَنَّ ٱللَّهَ يَهْدِى مَن يُرِيدُ ﴿١٦﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَٱلَّذِينَ هَادُوا۟ وَٱلصَّٰبِـِٔينَ وَٱلنَّصَٰرَىٰ وَٱلْمَجُوسَ وَٱلَّذِينَ أَشْرَكُوٓا۟ إِنَّ ٱللَّهَ يَفْصِلُ بَيْنَهُمْ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ شَهِيدٌ ﴿١٧﴾ أَلَمْ تَرَ أَنَّ ٱللَّهَ يَسْجُدُ لَهُۥ مَن فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَن فِى ٱلْأَرْضِ وَٱلشَّمْسُ وَٱلْقَمَرُ وَٱلنُّجُومُ وَٱلْجِبَالُ وَٱلشَّجَرُ وَٱلدَّوَآبُّ وَكَثِيرٌ مِّنَ ٱلنَّاسِ ۖ وَكَثِيرٌ حَقَّ عَلَيْهِ ٱلْعَذَابُ ۗ وَمَن يُهِنِ ٱللَّهُ فَمَا لَهُۥ مِن مُّكْرِمٍ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ يَفْعَلُ مَا يَشَآءُ ۩ ﴿١٨﴾ ۞ هَٰذَانِ خَصْمَانِ ٱخْتَصَمُوا۟ فِى رَبِّهِمْ ۖ فَٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ قُطِّعَتْ لَهُمْ ثِيَابٌ مِّن نَّارٍ يُصَبُّ مِن فَوْقِ رُءُوسِهِمُ ٱلْحَمِيمُ ﴿١٩﴾ يُصْهَرُ بِهِۦ مَا فِى بُطُونِهِمْ وَٱلْجُلُودُ ﴿٢٠﴾ وَلَهُم مَّقَٰمِعُ مِنْ حَدِيدٍ ﴿٢١﴾ كُلَّمَآ أَرَادُوٓا۟ أَن يَخْرُجُوا۟ مِنْهَا مِنْ غَمٍّ أُعِيدُوا۟ فِيهَا وَذُوقُوا۟ عَذَابَ ٱلْحَرِيقِ ﴿٢٢﴾ إِنَّ ٱللَّهَ يُدْخِلُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ جَنَّٰتٍ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ يُحَلَّوْنَ فِيهَا مِنْ أَسَاوِرَ مِن ذَهَبٍ وَلُؤْلُؤًا ۖ وَلِبَاسُهُمْ فِيهَا حَرِيرٌ ﴿٢٣﴾



(١٦) ئا بەو شێوەیە قورئانمان دابەزاندووە، کە ئایەتەکانی هەمووی روون و ئاشکران، بەڕاستی خوا هەر کەسێکی بوێت (شایستە بێت، بەم قورئانە) هیدایەتی دەدات.

(١٧) بەڕاستی ئەوانەی ئیمان و باوەڕیان هێناوە و ئەوانەش کە بوونەتە جوو، لەگەڵ صابئەکاندا کە فریشتە پەرست؛ یان ئەستێرە پەرستن و گاورەکان و ئاگرپەرستەکان و ئەوانەی کە هاوەڵایان (بۆ خوا) بڕیارداوە، بێگومان خوای گەورە لە رۆژی قیامەتدا جیایان دەکاتەوە لەیەکترو بڕیاری خۆی دەدات لەسەریان، بەڕاستی خوا شایەتە بەسەر هەموو شتێکەوە.

(١٨) ئایا نەتبینیوە و نەتبیستووە کە بەڕاستی هەرکەس و هەرچی هەیە لە ئاسمانەکان و زەویدا سوژدە بۆ خوا دەبەن، هەروەها خۆرو مانگ و ئەستێرە و چیاکان و درەخت و ماڵات و زۆرێک لەخەڵکی، زۆرێکیش خۆی شایستەی سزاو تۆڵە کردووە، جا ئەوەی خوا قەدرو رێزی بشکێنێت و ریسوای بکات ئەوە هیچ رێز لێنەرێکی نییە، بەڕاستی خوا ئەوەی بیەوێت دەیکات.

(١٩) ئەمانە دوودەستەی دژبەیەکن (ئیمانداران و بێباوەڕان) کردیانە کێشە لەبارەی پەروەردگاریانەوە (لە زات و سیفات و قەزاو قەدەری و...هتد): جا ئەوانەیان کە بێباوەڕ بوون پارچە پۆشاک لە ئاگر بڕراوە بەباڵایان، ئاوی زۆر لەکوڵ لەسەرویانەوە دەکرێت بەسەریاندا (لە دەرئەنجامی سەر سەختی و سەرکەشییاندا).

(٢٠) ئەو ئاوە لەکوڵە هەرچی لەناو سکیاندا هەیە بەپێستەکانەوە دەیتوێنێتەوە.

(٢١) گورزیش لە ئاسن (بۆ پیاماڵین و لێدانیان) ئامادەکراوە.

(٢٢) هەر کە هەوڵ بدەن و بیانەوێت خۆیان رزگار بکەن و لەو سزایە هەڵبێن (بەقامچی و تێهەڵدان) دەگێڕدرێنەوە ناوی و پێیان دەوترێت: بچێژن سزای سووتان و ئاگر.

(٢٣) بەڕاستی خوا ئەو کەسانەی کە باوەڕیان هێناوە و کردەوە چاکەکانیان ئەنجامداوە دەخاتە ناو باخەکانی بەهەشتەوە کە چەندەها رووبار بەژێر درەختەکانیدا و بەبەردەم کۆشکەکانیدا جاری و رەوانە، دەستیان دەڕازێنرێتەوە بەبازنی ئاڵتون و مرواری (لەشێوەی سەعاتی دەست و هەر جۆرێکدا کە حەزی لێ بکەن)، پۆشاکیشیان لەو بەهەشتەدا ئاوریشمی جوان و نایاب و هەمەڕەنگە.

وَهُدُوٓاْ إِلَى ٱلطَّيِّبِ مِنَ ٱلۡقَوۡلِ وَهُدُوٓاْ إِلَىٰ صِرَٰطِ ٱلۡحَمِيدِ ﴿٢٤﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ وَيَصُدُّونَ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ وَٱلۡمَسۡجِدِ ٱلۡحَرَامِ ٱلَّذِي جَعَلۡنَٰهُ لِلنَّاسِ سَوَآءً ٱلۡعَٰكِفُ فِيهِ وَٱلۡبَادِۚ وَمَن يُرِدۡ فِيهِ بِإِلۡحَادِۭ بِظُلۡمٖ نُّذِقۡهُ مِنۡ عَذَابٍ أَلِيمٖ ﴿٢٥﴾ وَإِذۡ بَوَّأۡنَا لِإِبۡرَٰهِيمَ مَكَانَ ٱلۡبَيۡتِ أَن لَّا تُشۡرِكۡ بِي شَيۡـٔٗا وَطَهِّرۡ بَيۡتِيَ لِلطَّآئِفِينَ وَٱلۡقَآئِمِينَ وَٱلرُّكَّعِ ٱلسُّجُودِ ﴿٢٦﴾ وَأَذِّن فِي ٱلنَّاسِ بِٱلۡحَجِّ يَأۡتُوكَ رِجَالٗا وَعَلَىٰ كُلِّ ضَامِرٖ يَأۡتِينَ مِن كُلِّ فَجٍّ عَمِيقٖ ﴿٢٧﴾ لِّيَشۡهَدُواْ مَنَٰفِعَ لَهُمۡ وَيَذۡكُرُواْ ٱسۡمَ ٱللَّهِ فِيٓ أَيَّامٖ مَّعۡلُومَٰتٍ عَلَىٰ مَا رَزَقَهُم مِّنۢ بَهِيمَةِ ٱلۡأَنۡعَٰمِۖ فَكُلُواْ مِنۡهَا وَأَطۡعِمُواْ ٱلۡبَآئِسَ ٱلۡفَقِيرَ ﴿٢٨﴾ ثُمَّ لۡيَقۡضُواْ تَفَثَهُمۡ وَلۡيُوفُواْ نُذُورَهُمۡ وَلۡيَطَّوَّفُواْ بِٱلۡبَيۡتِ ٱلۡعَتِيقِ ﴿٢٩﴾ ذَٰلِكَ وَمَن يُعَظِّمۡ حُرُمَٰتِ ٱللَّهِ فَهُوَ خَيۡرٞ لَّهُۥ عِندَ رَبِّهِۦۗ وَأُحِلَّتۡ لَكُمُ ٱلۡأَنۡعَٰمُ إِلَّا مَا يُتۡلَىٰ عَلَيۡكُمۡۖ فَٱجۡتَنِبُواْ ٱلرِّجۡسَ مِنَ ٱلۡأَوۡثَٰنِ وَٱجۡتَنِبُواْ قَوۡلَ ٱلزُّورِ ﴿٣٠﴾

(٢٤) ئەو بەختەوەرانە ڕێنموویی کراون بۆ گوفتاری جوان و پەسەند، هەروەها پێشتر ڕێنموویی کرابوون بۆ ڕێبازی ئەو پەروەردگارەی کە شایستەی شوکرو سوپاسە.

(٢٥) بێگومان ئەوانەی کە بێباوەڕ بوون و دژایەتی ڕێبازی خوا بەجۆرەها شێوە دەکەن و نایەڵن خەڵکی ڕووبکاتە مزگەوتی حەرام کە بڕیارمانداوە بۆ هەموو خەڵکی بێت چوونیەکە بۆ ئەوانەی کە لەوێ دەژین، یان ئەوانەی لە شوێنانی ترەوە بۆی دەچن، جا ئەوەی بیەوێت بەهۆی یاخی بوون و لادانەوە ستەم بکات، ئەوە سزایەکی بە ئازاری پێ دەچێژین.

(٢٦) (ئەی پێغەمبەرﷺ بەیاد بێنە) کاتێک شوێنی کەعبەمان دیاری کرد بۆ ئیبراهیم (دوای تەواوبوونی، فەرمانمان پێدا) کە هیچ جۆرە هاوەڵێکم بۆ بڕیار نەدەیت و (بیکە بە بنکەی یەکخواناسی) و ماڵی من پاک بکەرەوە بۆ ئەوانەی بەدەوریدا دەسوڕێنەوە، یاخود بە پێوەن یان لە کڕنووش و سوژدە بردندان.

(٢٧) جا بانگی خەڵکی بکە و جاڕ بدە لە ناویاندا با بێن بۆ حەج، ئەوانیش بەپیادە دێن بەدەم بانگەوازەکەتەوە، یان بەسواری (ئەو وشترانەی کە دووری ماوەکە) لاوازی کردوون و لە هەموو ڕێگەیەکی دوورەوە هەر دێن...

(٢٨) بۆ ئەوەی سوود و کەڵکی ماددی و مەعنەوی بەدەست بهێنن و ببینن و یادی خوا بکەن و ناوی پیرۆزی بەردەوام لەسەر زاریان بێت لە ڕۆژانێکی دیاریکراودا (کە ڕۆژانی عەرەفە و جەژنی قوربانە، سروودی (لبیك اللهم لبيك ،لبيك لا شريك لك لبيك، إن الحمد و النعمة لك والملك ، لاشريك لك)، لە حەجدا (الله أكبر، الله أكبر،الله أكبر، لا إله إلاالله و ألله اكبر، ألله أكبر ولله الحمد) لە ڕۆژانی جەژندا، فەرامۆش نەکەن، هەروەها ناوی خوا (بسم الله) بکەن لەکاتی سەربڕینی ئەو ماڵاتانەدا کە پێمان بەخشیوون، ئەوسا لە گۆشتەکەی بخۆن و بەشی هەژارو نەدارانیشی لێ بدەن.

(٢٩) لەوەودوا با چڵک و ئارەق و موو و نینۆک لە خۆیان دووربخەنەوە(ئیحرام بشکێنن)، هەروەها وەفا بکەن بە نەزرەکانیان و جێبەجێی بکەن و بەدەوری ماڵی دێرین و بەنرخی خوا (کەعبە)دا، با (طواف) بکەن.

(٣٠) (حەج ئەوەبوو کە باسکرا) جا ئەوەی کە سنوورەکانی خوا بپارێزێت و بەگەورە دایانبنێت و ڕێزی لێ بگرێت، بێگومان ئەوە چاکترە لای پەروەردگاری (بێ پاداشت نیە)...گۆشتی مەڕو بزن و گاو وشتر بۆتان حەڵاڵە جگە لەوانەی کە بەسەرتاندا دەخوێنرێتەوە و قەدەغەکراوە (کە لە سوورەتی المائدة دا باسکرا)، جا لەبەرئەوە خۆتان لە پەرستنی بتە ناپوخت و بێ نرخەکان بپارێزن، هەروەها لەگوفتاری درۆو قسەی هەڵبەستراو خۆتان دووربگرن.

حُنَفَآءَ لِلَّهِ غَيْرَ مُشْرِكِينَ بِهِۦ ۚ وَمَن يُشْرِكْ بِٱللَّهِ فَكَأَنَّمَا خَرَّ مِنَ ٱلسَّمَآءِ فَتَخْطَفُهُ ٱلطَّيْرُ أَوْ تَهْوِى بِهِ ٱلرِّيحُ فِى مَكَانٍ سَحِيقٍ ﴿٣١﴾ ذَٰلِكَ وَمَن يُعَظِّمْ شَعَٰٓئِرَ ٱللَّهِ فَإِنَّهَا مِن تَقْوَى ٱلْقُلُوبِ ﴿٣٢﴾ لَكُمْ فِيهَا مَنَٰفِعُ إِلَىٰٓ أَجَلٍ مُّسَمًّى ثُمَّ مَحِلُّهَآ إِلَى ٱلْبَيْتِ ٱلْعَتِيقِ ﴿٣٣﴾ وَلِكُلِّ أُمَّةٍ جَعَلْنَا مَنسَكًا لِّيَذْكُرُوا۟ ٱسْمَ ٱللَّهِ عَلَىٰ مَا رَزَقَهُم مِّنۢ بَهِيمَةِ ٱلْأَنْعَٰمِ ۗ فَإِلَٰهُكُمْ إِلَٰهٌ وَٰحِدٌ فَلَهُۥٓ أَسْلِمُوا۟ ۗ وَبَشِّرِ ٱلْمُخْبِتِينَ ﴿٣٤﴾ ٱلَّذِينَ إِذَا ذُكِرَ ٱللَّهُ وَجِلَتْ قُلُوبُهُمْ وَٱلصَّٰبِرِينَ عَلَىٰ مَآ أَصَابَهُمْ وَٱلْمُقِيمِى ٱلصَّلَوٰةِ وَمِمَّا رَزَقْنَٰهُمْ يُنفِقُونَ ﴿٣٥﴾ وَٱلْبُدْنَ جَعَلْنَٰهَا لَكُم مِّن شَعَٰٓئِرِ ٱللَّهِ لَكُمْ فِيهَا خَيْرٌ ۖ فَٱذْكُرُوا۟ ٱسْمَ ٱللَّهِ عَلَيْهَا صَوَآفَّ ۖ فَإِذَا وَجَبَتْ جُنُوبُهَا فَكُلُوا۟ مِنْهَا وَأَطْعِمُوا۟ ٱلْقَانِعَ وَٱلْمُعْتَرَّ ۚ كَذَٰلِكَ سَخَّرْنَٰهَا لَكُمْ لَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ ﴿٣٦﴾ لَن يَنَالَ ٱللَّهَ لُحُومُهَا وَلَا دِمَآؤُهَا وَلَٰكِن يَنَالُهُ ٱلتَّقْوَىٰ مِنكُمْ ۚ كَذَٰلِكَ سَخَّرَهَا لَكُمْ لِتُكَبِّرُوا۟ ٱللَّهَ عَلَىٰ مَا هَدَىٰكُمْ ۗ وَبَشِّرِ ٱلْمُحْسِنِينَ ﴿٣٧﴾ ۞ إِنَّ ٱللَّهَ يُدَٰفِعُ عَنِ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ كُلَّ خَوَّانٍ كَفُورٍ ﴿٣٨﴾



(٣١) هەوڵ بدەن هەمیشە شوێن راستی بکەون و ملکەچ بن بۆ حەق لەبەر خاتری زاتی خوا، نەکەن هیچ شەریک و هاوەڵێکی بۆ بڕیار بدەن، جا ئەوەی هاوەڵ و شەریک بۆ خوا بڕیار بدات، وەکو ئەوە وایە لە ئاسمانەوە بەر ببێتەوە و باڵندە پەلاماری بدات و (پارچە پارچەی بکات) یاخود رەشەبایەکی بەهێز بیفڕێنێت و بیبات بۆشوێنێکی دوور و قوڵ.

(٣٢) بەو شێوەیەی کە حەج باسکرا پێویستە ئەنجام بدرێت جا ئەوەی رێز دادەنێت بۆدروشم و بەرنامەکانی خوا، ئەوە نیشانەی پارێزکاری و لە خواترسانی دڵەکانە.

(٣٣) بۆتان هەیە چەندەها سوود وەرگرن لەو ماڵاتەی دانراوە بۆ قوربانی، تا کاتی دیاریکراو (کە رۆژانی جەژنی قوربانە) لەوەودوا شوێنی سەربڕینیان بەرەو ماڵە دێرینەکەی خوای گەورەیە.

(٣٤) بۆ هەر ئوممەتێک (لەئوممەتانی پێشوو) رێ و شوێن و بەرنامەیەکمان بۆ داناون (بۆ خواپەرستی و قوربانی) تا ناوی خوا بەرن لەکاتی سەربڕینی ماڵاتەکاندا، خوای ئێوە خوایەکی تاک و تەنهایە، هەمووتان تەسلیم و ملکەچی ئەوبن، مژدەش بدە بەبەندە ملکەچ و فەرمانبەردارو دڵ ئاوەدانەکان...

(٣٥) ئەوانەی کاتێک ناوی خوا برا (یا باسی دەسەلات و رەحمەت و زات و سیفاتی کرا) دڵەکانیان دادەچڵەکێت و تەزووی پیادا دێت، ئەوانەی خۆگرو ئارامگرن لە بەرامبەر ئەو ناخۆشیانەوە کە تووشیان دەبێت، ئەوانەی کە نوێژەکانیان بەچاکی ئەنجام دەدەن و لەو رزق و رۆزیەی کە پێمان بەخشیوون دەبەخشن.

(٣٦) ئێمە سەربڕینی قوربانییە دابستەکانمان بڕیارداوە کە هەندێک بن لە دروشمەکانی خوا (کە لەکاتی حەج و جەژنی قورباندا ئەنجام دەدرێت) بێگومان خێرو بێری زۆری تێدایە بۆتان (بازاڕی کڕین و فرۆشتن دەجولێنێت و هەژاران تێر دەبن لە گۆشت، پاداشتی زۆری قیامەتیش مسۆگەر دەکات..هتد) دە ناوی خوا ببەن لەکاتی سەربڕینیدا (بڵێن بسم الله...الله أكبر) کاتێک ئامادە کراون و ریزکراون بۆ سەربڕین، جاکاتێک کە سەربڕان و گیانیان تیادا نەماو پاک کران و پارچە پارچە کران لێیان بخۆن و بەشی هەژاران و سواڵکەرانی لێ بدەن، تا بەو شێوەیە ئێمە ماڵاتمان بۆ ئێوە رامهێناوە بۆ ئەوەی سوپاسی خوا بکەن.

(٣٧) دڵنیابن هەرگیز گۆشتەکەی و خوێنەکەی بەخوا ناگات، بەڵکو تەقواو پارێزکاری ئێوە بەو دەگات و (حسابی بۆ دەکات)، ئا بەو شێوەیە دەبینن بەچاوی خۆتان ماڵاتی بۆ ئێوە رام هێناوە، تا لەکاتی سەر بڕینیدا، الله اکبر بڵێن و قەدری پەروەردگاری گەورە بزانن کە هیدایەتی داون و مژدەیش بدە بە چاکەکاران و خێرخوازان.

(٣٨) بێگومان خوا پشتگیری دەکات لەوانەی کە ئیمان و باوەڕیان هێناوە چونکە بەراستی خوا هەموو خیانەتکارو کافرو بێ باوەڕێکی خۆش ناوێت.

أُذِنَ لِلَّذِينَ يُقَٰتَلُونَ بِأَنَّهُمْ ظُلِمُوا۟ ۚ وَإِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ نَصْرِهِمْ لَقَدِيرٌ ﴿٣٩﴾ ٱلَّذِينَ أُخْرِجُوا۟ مِن دِيَٰرِهِم بِغَيْرِ حَقٍّ إِلَّآ أَن يَقُولُوا۟ رَبُّنَا ٱللَّهُ ۗ وَلَوْلَا دَفْعُ ٱللَّهِ ٱلنَّاسَ بَعْضَهُم بِبَعْضٍ لَّهُدِّمَتْ صَوَٰمِعُ وَبِيَعٌ وَصَلَوَٰتٌ وَمَسَٰجِدُ يُذْكَرُ فِيهَا ٱسْمُ ٱللَّهِ كَثِيرًا ۗ وَلَيَنصُرَنَّ ٱللَّهُ مَن يَنصُرُهُۥٓ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ لَقَوِىٌّ عَزِيزٌ ﴿٤٠﴾ ٱلَّذِينَ إِن مَّكَّنَّٰهُمْ فِى ٱلْأَرْضِ أَقَامُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتَوُا۟ ٱلزَّكَوٰةَ وَأَمَرُوا۟ بِٱلْمَعْرُوفِ وَنَهَوْا۟ عَنِ ٱلْمُنكَرِ ۗ وَلِلَّهِ عَٰقِبَةُ ٱلْأُمُورِ ﴿٤١﴾ وَإِن يُكَذِّبُوكَ فَقَدْ كَذَّبَتْ قَبْلَهُمْ قَوْمُ نُوحٍ وَعَادٌ وَثَمُودُ ﴿٤٢﴾ وَقَوْمُ إِبْرَٰهِيمَ وَقَوْمُ لُوطٍ ﴿٤٣﴾ وَأَصْحَٰبُ مَدْيَنَ ۖ وَكُذِّبَ مُوسَىٰ فَأَمْلَيْتُ لِلْكَٰفِرِينَ ثُمَّ أَخَذْتُهُمْ ۖ فَكَيْفَ كَانَ نَكِيرِ ﴿٤٤﴾ فَكَأَيِّن مِّن قَرْيَةٍ أَهْلَكْنَٰهَا وَهِىَ ظَالِمَةٌ فَهِىَ خَاوِيَةٌ عَلَىٰ عُرُوشِهَا وَبِئْرٍ مُّعَطَّلَةٍ وَقَصْرٍ مَّشِيدٍ ﴿٤٥﴾ أَفَلَمْ يَسِيرُوا۟ فِى ٱلْأَرْضِ فَتَكُونَ لَهُمْ قُلُوبٌ يَعْقِلُونَ بِهَآ أَوْ ءَاذَانٌ يَسْمَعُونَ بِهَا ۖ فَإِنَّهَا لَا تَعْمَى ٱلْأَبْصَٰرُ وَلَٰكِن تَعْمَى ٱلْقُلُوبُ ٱلَّتِى فِى ٱلصُّدُورِ ﴿٤٦﴾

(٣٩) مۆڵەت دراوە بەو ئیماندارانەی شەڕیان پێدەگێڕن، کە بجەنگن و بەرهەڵستی بکەن چونکە بەڕاستی ستەم لێکراون، بێگومان خوا دەسەلاتی هەیە کە سەریان بخات و سەرکەوتنیان پێببەخشێت...

(٤٠) ئەوانەی کە بەناحەق لە وڵاتیان دەربەدەر کران (تەنها تاوانیان ئەوەبوو) کە دەیانوت: پەروەردگارمان (اللّٰه) یە، خۆ ئەگەر خوا خەڵکی نەدا بەیەکداو حەق دژی بەتاڵ نەوەستێت، هەرچی شوێنی خواپەرستی جولەکە و گاور هەیە لە خەڵوەتگە و کڵێساو کەنیسە، هەروەها مزگەوتانیش کەناوی خوای زۆر تێدا دەبرێت، هەمووی کاول دەکرێت، سوێند بێت بێگومان خوا ئەو کەسە سەردەخات کە پشتگیری ئاین و بەرنامەکەی دەکات و هەوڵی سەرخستنی دەدات، بەڕاستی خوا زۆر بەهێز و بالادەستە.

(٤١) ئەوانەی کە ئەگەر پایەدارمان کردن لە زەویدا نوێژ و دروشمەکانی بەچاکی رادەگرن، زەکاتیش بەتەواوی دەدەن، فەرمان بەچاکە دەکەن، قەدەغە لە خراپە دەکەن، سەرئەنجامی هەموو کارێکیش هەر بۆ لای خوا دەگەڕێتەوە.

(٤٢) ئەگەر خوانەناسان بڕوا بە تۆ ناکەن و بەدرۆت دەزانن، ئەوە دڵنیابە کە پێش ئەوان هۆزی نوح و عاد و ثەموود پێغەمبەرەکانی خۆیان بەدرۆ زانیوەو بڕوایان پێ‌نەکردوون.

(٤٣) هۆزی ئیبراهیم و هۆزی لوطیش (بڕوایان بە پێغەمبەرانی خۆیان نەکردووە).

(٤٤) هەروەها دانیشتوانی مەدیەن (بڕوایان بەشوعەیب نەکرد)، موساش بڕوای پێنەکراو بەدرۆ زانرا، منیش مۆڵەتی کافرانمدا (تا ماوەیەک) لەوەودوا هەموویانم گرت، ئیتر روون و ئاشکرایە کە تۆڵەو خەشم و قینم چۆن بوو.

(٤٥) چەندەها شارو شارۆچکەمان لەناوبرد لەکاتێکدا دانیشتوانی ستەمکار بوون، (ئەوەتە دەبینیت) خانووبەرەکانیان بەسەریەکدا تەپیووە، بیری ئاوی لەکار خراو، کۆشک و تەلاری بەرزو بڵندی زۆریشمان بەچۆڵی هێشتەوە و بێ‌خاوەن ماوەتەوە (کە بەڵگەیە لەسەر خەشم و قینی خوا لێیان).

(٤٦) ئایا ئەوانە بەسەر زەویدا نەڕۆیشتوون بەدڵ و دەروونێکی هوشیارەوە تا بیرێک بکەنەوە... (کوان: خەڵکانی رابوردوو؟ ئەو شارانە بۆ کاولکران؟ کێ ئێمەی دروست کردووە؟ ئامانج لە ژیان چیە؟؟) یان خاوەنی گوێ و دەزگای بیستن نەبوون بەسەرهاتەکانیان ببستن و لێکی بدەنەوە، جا وەنەبێت چاوان کوێر بووبێت، بەڵکو ئەو دڵانە کوێر دەبن کە وان لە سینەکاندا (چونکە هەر رواڵەت دەبینن و ناوەڕۆک لێک نادەنەوە).

وَيَسْتَعْجِلُونَكَ بِالْعَذَابِ وَلَن يُخْلِفَ اللَّهُ وَعْدَهُ وَإِنَّ يَوْمًا عِندَ رَبِّكَ كَأَلْفِ سَنَةٍ مِّمَّا تَعُدُّونَ ﴿٤٧﴾ وَكَأَيِّن مِّن قَرْيَةٍ أَمْلَيْتُ لَهَا وَهِيَ ظَالِمَةٌ ثُمَّ أَخَذْتُهَا وَإِلَيَّ الْمَصِيرُ ﴿٤٨﴾ قُلْ يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِنَّمَا أَنَا لَكُمْ نَذِيرٌ مُّبِينٌ ﴿٤٩﴾ فَالَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ لَهُم مَّغْفِرَةٌ وَرِزْقٌ كَرِيمٌ ﴿٥٠﴾ وَالَّذِينَ سَعَوْا فِي آيَاتِنَا مُعَاجِزِينَ أُولَٰئِكَ أَصْحَابُ الْجَحِيمِ ﴿٥١﴾ وَمَا أَرْسَلْنَا مِن قَبْلِكَ مِن رَّسُولٍ وَلَا نَبِيٍّ إِلَّا إِذَا تَمَنَّىٰ أَلْقَى الشَّيْطَانُ فِي أُمْنِيَّتِهِ فَيَنسَخُ اللَّهُ مَا يُلْقِي الشَّيْطَانُ ثُمَّ يُحْكِمُ اللَّهُ آيَاتِهِ وَاللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ ﴿٥٢﴾ لِّيَجْعَلَ مَا يُلْقِي الشَّيْطَانُ فِتْنَةً لِّلَّذِينَ فِي قُلُوبِهِم مَّرَضٌ وَالْقَاسِيَةِ قُلُوبُهُمْ وَإِنَّ الظَّالِمِينَ لَفِي شِقَاقٍ بَعِيدٍ ﴿٥٣﴾ وَلِيَعْلَمَ الَّذِينَ أُوتُوا الْعِلْمَ أَنَّهُ الْحَقُّ مِن رَّبِّكَ فَيُؤْمِنُوا بِهِ فَتُخْبِتَ لَهُ قُلُوبُهُمْ وَإِنَّ اللَّهَ لَهَادِ الَّذِينَ آمَنُوا إِلَىٰ صِرَاطٍ مُّسْتَقِيمٍ ﴿٥٤﴾ وَلَا يَزَالُ الَّذِينَ كَفَرُوا فِي مِرْيَةٍ مِّنْهُ حَتَّىٰ تَأْتِيَهُمُ السَّاعَةُ بَغْتَةً أَوْ يَأْتِيَهُمْ عَذَابُ يَوْمٍ عَقِيمٍ ﴿٥٥﴾

(٤٧) خوانەناسان پەلەت لێدەکەن کە ئەو سزایە زوو بەخەیان پێ بگرێت، بێگومان هەرگیز خوا لە بەڵێنی خۆی لانادات (لەسەر داخوازی نەفامان پاش و پێشی ناخات، چونکە کات و زەمان بایەخی نیە لای خوا) بەڕاستی ڕۆژێک لەلای ئەو پەروەردگارەت وەکو هەزار ساڵ وایە لەوەی کە دەیژمێرن.

(٤٨) چەندەها شارو شارۆچکە هەبوون کە من مۆڵەتمداون لەکاتێکدا دانیشتوانی ستەمکاریش بوون، دوای ماوەیەک لەناوم بردوون، سەرئەنجام و گەڕانەوەش هەر بۆ لای منە.

(٤٩) پێیان بڵێ: ئەی خەڵکینە من تەنها ترسێنەرو بێدارخەرەوەیەکی ئاشکرام بۆتان.

(٥٠) جا ئەوانەی ئیمان و باوەڕیان هێناوە و کارو کردەوە چاکەکانیان ئەنجامداوە لێخۆش بوون و ڕۆزی بەنرخ و فراوان بۆیان ئامادەیە.

(٥١) ئەو کەسانەش هەوڵ دەدەن بەربەست دابنێن لەبەردەم ئایەت و فەرمانەکانی ئێمەدا لە کاتێکدا دەستەوسانن، ئەوانە نیشتەجێی ناو دۆزەخن.

(٥٢) (ئەی محمد ﷺ) پێش تۆ هیچ پێغەمبەرێکی پەیامدار و بێ پەیامەمان ڕەوانە نەکردووە ئاواتی نەخواستبێت بەباوەڕ هێنانی قەومەکەی، بەڵام کاتێک ئاواتی خواستووە شەیتان ئەوەی بەفرسەت زانیوە، شتی نابەجێی تێکەڵ بەئاواتەکەی کردووە، ئینجا خوایش فریای کەوتووە و ئەوەی شەیتان فڕێی داوەتە ناو ئاواتەکەیەوە، سڕیویەتیەوە، لەوەودوا خوای گەورە ئایەت و بەرنامەکەی خۆی چەسپاو دامەزراو کردووە، خوا خۆی زاناو دانایە.

(٥٣) (خوای گەورە بۆیە ئەو دەسەڵاتەی داوە بەشەیتان) تا ئەو (خەتەرە و خەیاڵ و وەسوەسەیەی) شەیتان فڕێی دەداتە نێو ئاواتی پێغەمبەرانەوە ببێتە هۆی سزاو تاقیکردنەوە بۆ ئەوانەی لە دڵ و دەروونیاندا نەخۆشی دووڕوویی و ناپاکی هەیە و بۆ ئەوانەش کە بەرامبەر ئایینی خوا دڵ ڕەقن، بەڕاستی ستەمکاران لە دژایەتی و شەڕەنگێزیەکی قووڵ و بێ بندا ڕۆچوون.

(٥٤) بۆ ئەوەش ئەوانەی زانست و زانیاریان پێ بەخشراوە دڵنیابن و بزانن کە بێگومان ئەم قورئانە حەقیقەت و ڕاستە و لەلایەن پەروەردگاری تۆوە (ئەی محمد ﷺ) ڕەوانە کراوە، ئینجا بڕوای پتەوی پێ دەهێنن و دڵەکانیشیان ملکەچ دەبێت بۆ خوا، بێگومان خوا هیدایەتدەری ئەوانەیە کە باوەڕیان هێناوە بۆ ڕێگە و ڕێبازی ڕاست و دروست.

(٥٥) بەردەوام ئەوانەی کە بێ باوەڕن دەربارەی قورئان لە شک و گوماندان، هەتا کوتوپڕ قیامەت بەرپا دەبێت، یاخود تا ئەو کاتەی کە سزاو ئازار لە ڕۆژێکی بێ خێردا یەخەیان پێدەگرێت.

ٱلْمُلْكُ يَوْمَئِذٍ لِّلَّهِ يَحْكُمُ بَيْنَهُمْ ۚ فَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ فِى جَنَّٰتِ ٱلنَّعِيمِ ﴿٥٦﴾ وَٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ وَكَذَّبُوا۟ بِـَٔايَٰتِنَا فَأُو۟لَٰٓئِكَ لَهُمْ عَذَابٌ مُّهِينٌ ﴿٥٧﴾ وَٱلَّذِينَ هَاجَرُوا۟ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ ثُمَّ قُتِلُوٓا۟ أَوْ مَاتُوا۟ لَيَرْزُقَنَّهُمُ ٱللَّهُ رِزْقًا حَسَنًا ۚ وَإِنَّ ٱللَّهَ لَهُوَ خَيْرُ ٱلرَّٰزِقِينَ ﴿٥٨﴾ لَيُدْخِلَنَّهُم مُّدْخَلًا يَرْضَوْنَهُۥ ۗ وَإِنَّ ٱللَّهَ لَعَلِيمٌ حَلِيمٌ ﴿٥٩﴾ ۞ ذَٰلِكَ وَمَنْ عَاقَبَ بِمِثْلِ مَا عُوقِبَ بِهِۦ ثُمَّ بُغِىَ عَلَيْهِ لَيَنصُرَنَّهُ ٱللَّهُ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ لَعَفُوٌّ غَفُورٌ ﴿٦٠﴾ ذَٰلِكَ بِأَنَّ ٱللَّهَ يُولِجُ ٱلَّيْلَ فِى ٱلنَّهَارِ وَيُولِجُ ٱلنَّهَارَ فِى ٱلَّيْلِ وَأَنَّ ٱللَّهَ سَمِيعٌۢ بَصِيرٌ ﴿٦١﴾ ذَٰلِكَ بِأَنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلْحَقُّ وَأَنَّ مَا يَدْعُونَ مِن دُونِهِۦ هُوَ ٱلْبَٰطِلُ وَأَنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلْعَلِىُّ ٱلْكَبِيرُ ﴿٦٢﴾ أَلَمْ تَرَ أَنَّ ٱللَّهَ أَنزَلَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءً فَتُصْبِحُ ٱلْأَرْضُ مُخْضَرَّةً ۗ إِنَّ ٱللَّهَ لَطِيفٌ خَبِيرٌ ﴿٦٣﴾ لَّهُۥ مَا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِى ٱلْأَرْضِ ۗ وَإِنَّ ٱللَّهَ لَهُوَ ٱلْغَنِىُّ ٱلْحَمِيدُ ﴿٦٤﴾



(٥٦) ئەو رۆژە پاشایەتی و دەسەڵات تەنها بە دەست خوایە و فەرمانڕەوای لە نێوانیاندا دەکات، جا ئەوانەی کە باوەڕیان هێناوە و کارو کردەوە چاکەکانیان ئەنجامداوە لە چەندەها باخی پڕ لە نازو نیعمەتەکاندان.

(٥٧) ئەوانەش کە بێ باوەڕ بوون و ئایەت و فەرمانەکانی ئێمەیان بەدرۆ زانیوە، ئا ئەوانە بەهۆی بیروباوەڕی ناپەسەندیانەوە سزای پڕ لە خەجاڵەتی و ریسواکەریان بۆ ئامادەیە.

(٥٨) ئەوانەش کە لەبەر رەزامەندی خواو لە پێناوی سەرخستنی رێبازەکەی ئەودا کۆچیان کرد لەوەودوا کوژران و شەهیدکران یاخود مردن، سوێند بێت بێگومان خوا لە رزق و رۆزی چاک بەهرەوەریان دەکات، بەڕاستی خوا هەر خۆی چاکترین رزق و رۆزی بەخشە.

(٥٩) سوێند بێت خوای گەورە ئەو جۆرە کەسانە دەخاتە شوێنێکەوە کە زۆر پێی رازی و خۆشنوود دەبن، بەڕاستی خوا زانایە (بەهەوڵ و کۆشش و نیەت و چاکەیان) و خۆگرە (زۆر پەلە ناکات لە تۆڵەسەندندا).

(٦٠) ئەوە بڕیادادەی خوابوو، هەرکەسێک تۆڵە بسێنێت لە ستەمکار بەئەندازەی ئەوەی کە ستەمی لێکراوە، لەوەودوا دەستدرێژیی بکرێتەوە سەرو ستەمی لێ بکرێت، ئەوە بێگومان خوا سەری دەخات بەسەر ئەو ستەمکارەدا، بەڕاستی خوا زۆر چاوپۆشی دەکات و لێخۆش بووە (لەو کەسانەی واز لە ستەم دەهێنن، یاخود توانای تۆڵەسەندنیان هەیە و چاوپۆشی دەکەن).

(٦١) ئەو سەرکەوتنە بەهۆی ئەوەوەیە کە بەڕاستی خوای گەورە زاتێکە (ئەوەندە بەتوانایە) شەو تێهەڵکێشی رۆژ دەکات و رۆژ تێهەڵکێشی شەو دەکات، بەڕاستی خوا بیسەرو بینایە (بەهەڵسوکەوت و قسەو گوفتاری بەندەکانی).

(٦٢) ئەو بیستن و بینینەش بەهۆی ئەوەیە چونکە بەڕاستی هەر خوا خۆی حەق و ڕاستە، ئەوانەش کە ئەوان هاناو هاواری بۆ دەبەن لە جیاتی ئەو هەر ئەوە خۆی بەتاڵ و ناحەقیە، بێگومان ئەو خوایە بڵندو بەرزو مەزن و گەورەیە.

(٦٣) ئایا نەتبینیووە کە بەڕاستی خوا بارانی لە ئاسمانەوە باراندووە و زەوی زۆر پێ سەوز دەبێت، بەڕاستی خوا وردبین و بەسۆزو دلۆڤان و ئاگایە.

(٦٤) هەرچی لە ئاسمانەکاندایە و هەرچی لە زەویدا هەیە هەمووی ئەو زاتە خاوەنیانە، بەڕاستی هەر خوا خۆی دەوڵەمەند و بێ نیازە و هەر خۆی شایستەی سوپاس و ستایشە.

أَلَمْ تَرَ أَنَّ ٱللَّهَ سَخَّرَ لَكُم مَّا فِي ٱلْأَرْضِ وَٱلْفُلْكَ تَجْرِي فِي ٱلْبَحْرِ بِأَمْرِهِۦ وَيُمْسِكُ ٱلسَّمَآءَ أَن تَقَعَ عَلَى ٱلْأَرْضِ إِلَّا بِإِذْنِهِۦٓ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ بِٱلنَّاسِ لَرَءُوفٌ رَّحِيمٌ ﴿٦٥﴾ وَهُوَ ٱلَّذِيٓ أَحْيَاكُمْ ثُمَّ يُمِيتُكُمْ ثُمَّ يُحْيِيكُمْ ۗ إِنَّ ٱلْإِنسَٰنَ لَكَفُورٌ ﴿٦٦﴾ لِّكُلِّ أُمَّةٍ جَعَلْنَا مَنسَكًا هُمْ نَاسِكُوهُ ۖ فَلَا يُنَٰزِعُنَّكَ فِي ٱلْأَمْرِ ۚ وَٱدْعُ إِلَىٰ رَبِّكَ ۖ إِنَّكَ لَعَلَىٰ هُدًى مُّسْتَقِيمٍ ﴿٦٧﴾ وَإِن جَٰدَلُوكَ فَقُلِ ٱللَّهُ أَعْلَمُ بِمَا تَعْمَلُونَ ﴿٦٨﴾ ٱللَّهُ يَحْكُمُ بَيْنَكُمْ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ فِيمَا كُنتُمْ فِيهِ تَخْتَلِفُونَ ﴿٦٩﴾ أَلَمْ تَعْلَمْ أَنَّ ٱللَّهَ يَعْلَمُ مَا فِي ٱلسَّمَآءِ وَٱلْأَرْضِ ۗ إِنَّ ذَٰلِكَ فِي كِتَٰبٍ ۚ إِنَّ ذَٰلِكَ عَلَى ٱللَّهِ يَسِيرٌ ﴿٧٠﴾ وَيَعْبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ مَا لَمْ يُنَزِّلْ بِهِۦ سُلْطَٰنًا وَمَا لَيْسَ لَهُم بِهِۦ عِلْمٌ ۗ وَمَا لِلظَّٰلِمِينَ مِن نَّصِيرٍ ﴿٧١﴾ وَإِذَا تُتْلَىٰ عَلَيْهِمْ ءَايَٰتُنَا بَيِّنَٰتٍ تَعْرِفُ فِي وُجُوهِ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ ٱلْمُنكَرَ ۖ يَكَادُونَ يَسْطُونَ بِٱلَّذِينَ يَتْلُونَ عَلَيْهِمْ ءَايَٰتِنَا ۗ قُلْ أَفَأُنَبِّئُكُم بِشَرٍّ مِّن ذَٰلِكُمُ ۗ ٱلنَّارُ وَعَدَهَا ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ ۖ وَبِئْسَ ٱلْمَصِيرُ ﴿٧٢﴾

(٦٥) ئایا بەچاوی خۆت نەتبینیوە چۆن خوای گەورە هەرچی لە زەویدا هەیە بۆ ئێوەی رام هێناوە، هەروەها کەشتیەکانیش کە لە دەریاکاندا دەڕوات بەفەرمانی ئەو زاتە، ئاسمانیش راگیر دەکات لەوەی کە بکەوێت بەسەر زەویدا مەگەر بەویست و فەرمانی خۆی، بەڕاستی خوا بۆ خەڵکی زۆر بەسۆزو میهرەبان و لێخۆشبوو بەخشندەیە.

(٦٦) هەر ئەو زاتە ژیانی پێبەخشیوون، لەوەودوا ئەو دەتانمرێنێت، پاشان زیندووتان دەکاتەوە، (لەگەڵ ئەم هەموو شتانەدا) زۆربەی خەڵکی سپڵەو بەدنمەکە.

(٦٧) بۆهەر میللەتێک بەرنامە و پرۆگرامێکمان دیاری کردووە پەیڕەوی دەکەن و لەسەری دەڕۆن (بەگوێرەی کات و شوێن و بارودۆخیان، ئەم بەرنامەیەشمان ناردووە بۆ هەتا هەتایی) کەواتە با خاوەن ئایینەکانی تر نەیکەنە کێشە و ئاژاوە لەگەڵتدا لەبارەی ئەم ئایینەوە، ئەی محمد ﷺ بەردەوام بانگەوازی خەڵکی بکە بۆ لای پەروەردگارت چونکە بەڕاستی تۆ لەسەر رێگە و رێباز و هیدایەتێکی راست و دروستیت.

(٦٨) خۆ ئەگەر موجادەلەت لەگەڵدا بکەن (ئەوە تۆ موجادەڵە مەکە بەڵکو) بڵێ: خوا خۆی چاک زانایە بەو کارو کردەوانەی کە ئەنجامی دەدەن.

(٦٩) هەر خوا خۆی لە رۆژی قیامەتدا داوەری دەکات لە نێوانتاندا لەسەر ئەو شتانەی کە ئێوە کێشە و جیاوازیتان لەسەر دەکرد (لەوێ راستیەکان بەتەواوی دەردەکەوێت).

(٧٠) (ئەی هۆشمەند) مەگەر نەتزانیووە کە بەڕاستی خوا ئاگاو زانایە بەهەرچی لە ئاسمان و زەویدا هەیە و هەموو ئەو شتانەی (کە دەیکەن) لە کتێب و دۆسیەی (لوح المحفوظ)دا تۆمارکراوە، بەڕاستی ئەوکارە بۆ خوا زۆر ئاسانە.

(٧١) (موشریک و هاوەڵگەران) لە جیاتی خواپەرستی شتێک دەپەرستن کە خوا هیچ بەڵگەیەکی رەوانە نەکردووە لەسەری(کە رەوایە بیپەرستن) و خۆیشیان هیچ زانیاریەکیان دەربارەی نیە، ستەمکارانیش هیچ جۆرە پشتیوانێکیان نیە (تا لە قیامەتدا فریایان بکەوێت).

(٧٢) کاتێک کە ئایەتەکانی ئێمە بەروونی و ئاشکرایی بەسەریاندا دەخوێنرێتەوە، لە رووخساری ئەوانەدا کە بێباوەڕن بێزاری و تاڵی و گرژی بەدی دەکەیت، بەجۆرێک خەریکە هێرش بەرنە سەر ئەوانەی کە ئایەتەکانی ئێمەیان بەسەردا دەخوێننەوە، پێیان بڵێ: ئایا هەواڵتان بدەمێ بە خراپتر لەو کینەو بوغزەتان؟! ئەویش ئاگری دۆزەخە!! کە خوای گەورە بەڵێنی داوە بەوانەی کە بێ باوەڕن پێی، ئای کە سەرەنجام و چارەنووسێکی خراپە.

يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ضُرِبَ مَثَلٌ فَٱسْتَمِعُواْ لَهُۥٓ ۚ إِنَّ ٱلَّذِينَ تَدْعُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ لَن يَخْلُقُواْ ذُبَابًا وَلَوِ ٱجْتَمَعُواْ لَهُۥ ۖ وَإِن يَسْلُبْهُمُ ٱلذُّبَابُ شَيْـًٔا لَّا يَسْتَنقِذُوهُ مِنْهُ ۚ ضَعُفَ ٱلطَّالِبُ وَٱلْمَطْلُوبُ ﴿٧٣﴾ مَا قَدَرُواْ ٱللَّهَ حَقَّ قَدْرِهِۦٓ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ لَقَوِىٌّ عَزِيزٌ ﴿٧٤﴾ ٱللَّهُ يَصْطَفِى مِنَ ٱلْمَلَـٰٓئِكَةِ رُسُلًا وَمِنَ ٱلنَّاسِ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ سَمِيعٌۢ بَصِيرٌ ﴿٧٥﴾ يَعْلَمُ مَا بَيْنَ أَيْدِيهِمْ وَمَا خَلْفَهُمْ ۗ وَإِلَى ٱللَّهِ تُرْجَعُ ٱلْأُمُورُ ﴿٧٦﴾ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱرْكَعُواْ وَٱسْجُدُواْ وَٱعْبُدُواْ رَبَّكُمْ وَٱفْعَلُواْ ٱلْخَيْرَ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ ۩ ﴿٧٧﴾ وَجَـٰهِدُواْ فِى ٱللَّهِ حَقَّ جِهَادِهِۦ ۚ هُوَ ٱجْتَبَىٰكُمْ وَمَا جَعَلَ عَلَيْكُمْ فِى ٱلدِّينِ مِنْ حَرَجٍ ۚ مِّلَّةَ أَبِيكُمْ إِبْرَٰهِيمَ ۚ هُوَ سَمَّىٰكُمُ ٱلْمُسْلِمِينَ مِن قَبْلُ وَفِى هَـٰذَا لِيَكُونَ ٱلرَّسُولُ شَهِيدًا عَلَيْكُمْ وَتَكُونُواْ شُهَدَآءَ عَلَى ٱلنَّاسِ ۚ فَأَقِيمُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتُواْ ٱلزَّكَوٰةَ وَٱعْتَصِمُواْ بِٱللَّهِ هُوَ مَوْلَىٰكُمْ ۖ فَنِعْمَ ٱلْمَوْلَىٰ وَنِعْمَ ٱلنَّصِيرُ ﴿٧٨﴾

سُورَةُ المُؤْمِنُون

سجدة

(٧٣) ئەی خەڵکینە: نموونەیەک هێنراوەتەوە چاک گوێی بۆ بگرن؛ بەڕاستی ئەوانەی کە هاناو هاواریان لێدەکەن لەجیاتی خوا، هەرگیز ناتوانن تاکە مێشێک دروست بکەن، هەرچەندە بۆ ئەو کارە کۆببنەوە و (یارمەتی یەکتریش بدەن) و ئەگەر مێشەکە شتێکیان لیٚ بفڕێنێت، ناتوانن لێی بسەننەوە، داواکارو داوالێکراو هەردووکیان لاواز و بێ دەسەلاٚتن.

(٧٤) ئەوانە (وەکو پێویست) قەدری خوایان بەچاکی نەزانی، ڕێزی پەروەردگاریان بەتەواوی نەگرت، لەکاتێکدا بەڕاستی خوا زۆر بەهێزو بە توانا و باڵادەستە.

(٧٥) هەر خوا بەویستی خۆی لە فریشتەکان و لەخەڵکیش فرستادە هەڵدەبژێرێت، بەڕاستی خوا بیسەرو بینایە (چاک دەزانێت کێ هەڵدەبژێرێت بۆ گەیاندنی پەیامەکەی).

(٧٦) خوا ئاگایە بەوەی کە لە پێشیانەوە ڕووی داوەو بەوەش کە لە ئایندە و داهاتوودا ڕوو دەدات و هەموو کارو هەموو شتێک بۆ لای خوا دەبرێتەوە.

(٧٧) ئەی ئەو کەسانەی ئیمان و باوەڕتان هێناوە کڕنووش و سوژدە بەرن و (نوێژەکانتان بەجوانی بکەن) و پەروەردگارتان بپەرستن لە هەموو بارودۆخێکداو تا دەتوانن چاکە و چاکەکاری ئەنجام بدەن بۆ ئەوەی سەرفرازو سەرکەوتووبن...

(٧٨) هەروەها بەردەوام بن لە خەبات و جیهاد و هەوڵ و کۆشش لە پێناوی خوادا بەو شێوەیەی کە شایستەیەتی، لەبەر خاتری ئەو بێت، ئەو زاتە بۆ ئەوە هەڵی بژاردوون و لە ئاین و بەرنامەکەیدا هیچ جۆرە شتێکی نارەواو قورس و گرانی لەسەر دانەناون (کە نەتوانن ئەنجامی بدەن، جا ئەم بەرنامەیە) ڕێ و شوێن و بەرنامەی ئیبراهیمی باواتانە کە پێشتر هەر خوای گەورە ناوی ناون موسڵمان و لەم قورئانەشدا بەموسڵمان ناوی بردوون، تا پێغەمبەر ببێتە شایەت بەسەرتانەوە (کە پەیامی خوای پێ ڕاگەیاندوون) و ئێوەش (بەگەیاندنی ئەو پەیامە) ببنە شایەت بەسەر خەڵکیەوە، کەواتە نوێژەکانتان بەچاکی ئەنجام بدەن و زەکاتیش (لە ماڵ و سامان و زانستی و هێزتان) دەربکەن و پشت بەخوا ببەستن، چونکە هەر ئەو زاتە یارو یاوەرتانە، جا دڵنیابن کە خوا چەندە یارمەتیدەرێکی چاکە و چەندە پشت و پەنایەکی بەهێزو بە نرخە.

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

قَدۡ أَفۡلَحَ ٱلۡمُؤۡمِنُونَ ﴿١﴾ ٱلَّذِينَ هُمۡ فِي صَلَاتِهِمۡ خَٰشِعُونَ ﴿٢﴾ وَٱلَّذِينَ هُمۡ عَنِ ٱللَّغۡوِ مُعۡرِضُونَ ﴿٣﴾ وَٱلَّذِينَ هُمۡ لِلزَّكَوٰةِ فَٰعِلُونَ ﴿٤﴾ وَٱلَّذِينَ هُمۡ لِفُرُوجِهِمۡ حَٰفِظُونَ ﴿٥﴾ إِلَّا عَلَىٰٓ أَزۡوَٰجِهِمۡ أَوۡ مَا مَلَكَتۡ أَيۡمَٰنُهُمۡ فَإِنَّهُمۡ غَيۡرُ مَلُومِينَ ﴿٦﴾ فَمَنِ ٱبۡتَغَىٰ وَرَآءَ ذَٰلِكَ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡعَادُونَ ﴿٧﴾ وَٱلَّذِينَ هُمۡ لِأَمَٰنَٰتِهِمۡ وَعَهۡدِهِمۡ رَٰعُونَ ﴿٨﴾ وَٱلَّذِينَ هُمۡ عَلَىٰ صَلَوَٰتِهِمۡ يُحَافِظُونَ ﴿٩﴾ أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡوَٰرِثُونَ ﴿١٠﴾ ٱلَّذِينَ يَرِثُونَ ٱلۡفِرۡدَوۡسَ هُمۡ فِيهَا خَٰلِدُونَ ﴿١١﴾ وَلَقَدۡ خَلَقۡنَا ٱلۡإِنسَٰنَ مِن سُلَٰلَةٖ مِّن طِينٖ ﴿١٢﴾ ثُمَّ جَعَلۡنَٰهُ نُطۡفَةٗ فِي قَرَارٖ مَّكِينٖ ﴿١٣﴾ ثُمَّ خَلَقۡنَا ٱلنُّطۡفَةَ عَلَقَةٗ فَخَلَقۡنَا ٱلۡعَلَقَةَ مُضۡغَةٗ فَخَلَقۡنَا ٱلۡمُضۡغَةَ عِظَٰمٗا فَكَسَوۡنَا ٱلۡعِظَٰمَ لَحۡمٗا ثُمَّ أَنشَأۡنَٰهُ خَلۡقًا ءَاخَرَۚ فَتَبَارَكَ ٱللَّهُ أَحۡسَنُ ٱلۡخَٰلِقِينَ ﴿١٤﴾ ثُمَّ إِنَّكُم بَعۡدَ ذَٰلِكَ لَمَيِّتُونَ ﴿١٥﴾ ثُمَّ إِنَّكُمۡ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ تُبۡعَثُونَ ﴿١٦﴾ وَلَقَدۡ خَلَقۡنَا فَوۡقَكُمۡ سَبۡعَ طَرَآئِقَ وَمَا كُنَّا عَنِ ٱلۡخَلۡقِ غَٰفِلِينَ ﴿١٧﴾

سورەتی (المؤمنون)

بەناوی خوای بەخشندە و میهرەبان

(١) بەڕاستی ئەو بڕوادارانە سەرکەوتوو سەرفراز بوون...

(٢) ئەوانەش ئەوانەن کە لە نوێژەکانیاندا ملکەچ و دڵ ئارام و دڵ دامەزراون و دڵیان لای خوایە...

(٣) ئەوانەش کە لە گوفتاری بێ سوودو کرداری نابەجێ و بێ هوودە دوورە پەرێزن...

(٤) هەروەها ئەوانەش کە زەکاتیماڵیان دەردەکەن...

(٥) ئەوانەش کە پارێزەری داوێنی خۆیانن...

(٦) جگە لەگەڵ هاوسەران و کەنیزەکەکانیاندا نەبێت، کە ئەوە جێگەی لۆمە و سەرزەنشت نیە، (لەبارودۆخی ناناسایدا بەهۆی جەنگەوە ئافرەتانی موسڵمان دەکەونە دەست دوژمنان و دەستدرێژی بێ سنوور دەکرێتە سەریان، دوور نیە ئافرەتانی دوژمن نەکەوێتە دەست ئیمانداران، ئەوکاتە تەنها یەک کەس دەبێتە هاوسەری و، بەڕێزەوە رەفتاری لەگەڵ دەکات).

(٧) جا ئەوەی جگە لەو سنوورە دیاری کراوە، ڕێگە و ڕێبازی تر بگرێتەبەر، ئەو جۆرە کەسانە بە یاخی و لە سنوور دەرچوو دەژمێردرێن.

(٨) هەروەها ئەوانەی کە چاودێری ئەمانەت و پەیمانەکانیان دەکەن (خیانەت و فێڵ ناکەن).

(٩) ئەوانەش کە پابەندی نوێژەکانن و لەکاتی خۆیدا بەڕێکو پێکی ئەنجامی دەدەن و دەیپارێزن.

(١٠) ئا ئەوانە میراتگران و خاوەنانی بەهەشتن.

(١١) ئەوانە دەبنە خاوەنی بەهەشتی فیردەوس (کە بەرزترین و بەنرخترین بەهەشتە) و بۆ هەمیشە ژیانی ئەبراوەی تیادا دەبەنە سەر (لەوپەڕی لاوێتی و تەندروستی و ئاسوودەییدا).

(١٢) سوێند بەخوا بەڕاستی ئێمە ئادەمیزادمان لە ئاوێتەیەکی پێکهاتوو لە قوڕ بەدیهێناوە.

(١٣) لەوەودوا لە جێگەیەکی پارێزراو و لەباردا (کە منداڵدانی دایکە) لە شێوەی نوتفەیەکی زۆر بچووکدا دامان مەزراندووە.

(١٤) لەوەودوا نوتفەکەمان کردووە بەخۆهەڵواسەرێک (سەرەمێکوتەیەک) پاشان خۆهەڵواسەرەکەمان کردووە بە گۆشتپارەیەک، ئینجا (شێوازی) گۆشتپارەکەمان بەپەیکەری ئێسک گۆڕیوە و بەگۆشت پەیکەری ئێسکەکەمان داپۆشیوە، ئەوسا لە شێوەیەکی تردا دەرمان هێناوە (کە شێوەی ئادەمیزادێکی ڕێکوپێکە و ڕۆحی پێ بەخشراوە)، بەڕاستی خوای مەزن بەرزو پیرۆزو موبارەکە و چاکترین بەدیهێنەر و چاکترین دروستکارە.

(١٥) بێگومان سەرەنجام ئێوە هەر دەبێت بمرن (لەتوێی خاکدا دەبێت مەنزڵ بگرن).

(١٦) پاشان دەبێت لە ڕۆژی قیامەتدا زیندوو بکرێنەوە (بۆ پاداشت و لێپرسینەوە).

(١٧) سوێند بەخوا بەڕاستی ئێمە لەسەرتانەوە حەوت چین ئاسمانمان دروستکردووە و ئێمە هەرگیز لە دروست کراوان غافڵ و بێ ئاگا نین (هیچ شتێکمان لێ بزر نابێت و هیچ شتێک پشتگوێ ناخەین).

وَأَنزَلْنَا مِنَ السَّمَاءِ مَاءً بِقَدَرٍ فَأَسْكَنَّاهُ فِي الْأَرْضِ وَإِنَّا عَلَىٰ ذَهَابٍ بِهِ لَقَادِرُونَ ﴿١٨﴾ فَأَنشَأْنَا لَكُم بِهِ جَنَّاتٍ مِّن نَّخِيلٍ وَأَعْنَابٍ لَّكُمْ فِيهَا فَوَاكِهُ كَثِيرَةٌ وَمِنْهَا تَأْكُلُونَ ﴿١٩﴾ وَشَجَرَةً تَخْرُجُ مِن طُورِ سَيْنَاءَ تَنبُتُ بِالدُّهْنِ وَصِبْغٍ لِّلْآكِلِينَ ﴿٢٠﴾ وَإِنَّ لَكُمْ فِي الْأَنْعَامِ لَعِبْرَةً نُّسْقِيكُم مِّمَّا فِي بُطُونِهَا وَلَكُمْ فِيهَا مَنَافِعُ كَثِيرَةٌ وَمِنْهَا تَأْكُلُونَ ﴿٢١﴾ وَعَلَيْهَا وَعَلَى الْفُلْكِ تُحْمَلُونَ ﴿٢٢﴾ وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا نُوحًا إِلَىٰ قَوْمِهِ فَقَالَ يَا قَوْمِ اعْبُدُوا اللَّهَ مَا لَكُم مِّنْ إِلَٰهٍ غَيْرُهُ أَفَلَا تَتَّقُونَ ﴿٢٣﴾ فَقَالَ الْمَلَأُ الَّذِينَ كَفَرُوا مِن قَوْمِهِ مَا هَٰذَا إِلَّا بَشَرٌ مِّثْلُكُمْ يُرِيدُ أَن يَتَفَضَّلَ عَلَيْكُمْ وَلَوْ شَاءَ اللَّهُ لَأَنزَلَ مَلَائِكَةً مَّا سَمِعْنَا بِهَٰذَا فِي آبَائِنَا الْأَوَّلِينَ ﴿٢٤﴾ إِنْ هُوَ إِلَّا رَجُلٌ بِهِ جِنَّةٌ فَتَرَبَّصُوا بِهِ حَتَّىٰ حِينٍ ﴿٢٥﴾ قَالَ رَبِّ انصُرْنِي بِمَا كَذَّبُونِ ﴿٢٦﴾ فَأَوْحَيْنَا إِلَيْهِ أَنِ اصْنَعِ الْفُلْكَ بِأَعْيُنِنَا وَوَحْيِنَا فَإِذَا جَاءَ أَمْرُنَا وَفَارَ التَّنُّورُ فَاسْلُكْ فِيهَا مِن كُلٍّ زَوْجَيْنِ اثْنَيْنِ وَأَهْلَكَ إِلَّا مَن سَبَقَ عَلَيْهِ الْقَوْلُ مِنْهُمْ وَلَا تُخَاطِبْنِي فِي الَّذِينَ ظَلَمُوا إِنَّهُم مُّغْرَقُونَ ﴿٢٧﴾

(١٨) هەر ئێمە لە ئاسمانەوە بە ئەندازە و نەخشەیەکی دیاریکراو بارانمان باراندووە و ئینجا لە ناخی زەویدا جێگیرمان کردووە، بێگومان ئێمە بەجۆرەها شێوە دەتوانین ئەو ئاوە لەناو بەرین و ئەو سەرچاوانە وشک بکەین.

(١٩) ئێمە بەهۆی ئەو ئاوەوە چەندەها باخ و باخاتی خورما و ڕەزمان بەدی هێناوە بۆتان، (لەو باخ و باخچانەدا) میوەهاتی جۆراو جۆری زۆر و زەبەندەمان بۆ بەدیهێناون، لە هەندێکیان دەخۆن.

(٢٠) درەختێکیشمان بۆ رواندوون کە لە کێوی طور لە بیابانی سینا سەوز دەبێت کە ڕۆن و چەوری لێ دەردەهێنرێت و ئامادەیە بۆ کەسانێک کە دەیخۆن (مەبەست درەختی زەیتونە کە هەمیشە سەوزە و تەمەن درێژە و بێ ئەرکە و کالیسیۆم و ئاسن و فۆسفۆر و ڤیتامینی جۆراوجۆر و پرۆتینی تێدایە، گەڵێک داو و دەرمانیشی لێ دەردەهێنرێت).

(٢١) بەڕاستی لەبەدیهاتنی ماڵاتیشدا جێگەی سەرنج و پەندە بۆتان (کە ورد بینەوە و بەدیهێنەری جوانکار بناسن) جا لەوەی کە لە سکیاندا بەدی دێت(مەبەست شیرە) دەرخوارتان دەدەین و چەندەها کەڵکی زۆری تری هەیە بۆتان (لە پێستیان، لە خوری و موویان...هتد) هەروەها لێشیان دەخۆن (گۆشت و جگەرو سەرو پێیان بەجۆرەها شێوە ئامادە دەکەن و خواردنی خۆشیان لێ دروست دەکەن).

(٢٢) لەسەر پشتی هەندێک لەو گیانداراتەش هەڵدەگیرێن و لەسەر کەشتیەکانیش (دەگوێزرێنەوە لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی تر لەگەڵ کەلوپەل و پێداویستیەکانتاندا).

(٢٣) سوێند بێت بێگومان ئێمە نوح پێغەمبەرمان ڕەوانە کرد بۆ سەر قەومەکەی، جا پێی وتن: ئەی قەوم و گەلم هەر خوا بپەرستن، چونکە هیچ خوایەکی ترتان نیە جگە لەو، ئایا خۆتان لە خەشم و قینی ناپارێزن؟!

(٢٤) جا ئەوانەی کە بێباوەڕ بوون لە دەستەی دەسەڵاتداری قەومەکەی وتیان: (گوێی بۆ مەگرن) ئەم پیاوە هەر کەسێکی وەک ئێوەیە، زیاتر نیە، دەیەوێت خۆی بکاتە گەورەتان!! ئەگەر خوا بیویستایە پێغەمبەرێک بنێرێت، ئەوە فریشتەی دادەبەزاند، ئێمە ئەم هەواڵەمان لە باو و باپیرانی پێشووەوە نەبیستووە.

(٢٥) ئەمە جگە لەوەی کە پیاوێکە شێتی سەری لێداوە، هیچی تر نیە، کەواتە تا ماوەیەک مۆڵەتی بدەن و وازی لێ بهێنن،(یان کۆڵ دەدات، یان دەمرێت!!!).

(٢٦) ئەوسا نوح وتی: پەروەردگارا، سەرکەوتنم پێ ببەخشە چونکە بڕوایان پێ نەکردم.

(٢٧) ئینجا ئێمەش ئاگادارمان کرد کە کەشتیەکە دروست بکە لەژێر چاودێری و نیگای ئێمەدا، جا هەر کاتێک فەرمانی ئێمە دەرچوو، تەنوورەکە فوارەی کردو ئاوی لێ دەرهات، ئەوە لە هەموو جۆرێک جووتێک سوار بکە، هەروەها خاوو خێزانت جگە لەوانەی کە پێشتر بڕیاری غەرق بوونیان لەسەر دراوە، جا دەربارەی ئەوانەی کە ستەمیان کرد و (باوەڕیان نەهێنا) لێم مەپاڕێرەوە، چونکە بەڕاستی ئەوانە هەموو نوقم کراون (لە زریانەکەدا).

فَإِذَا اسْتَوَيْتَ أَنتَ وَمَن مَّعَكَ عَلَى الْفُلْكِ فَقُلِ الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِي نَجَّانَا مِنَ الْقَوْمِ الظَّالِمِينَ ﴿٢٨﴾ وَقُل رَّبِّ أَنزِلْنِي مُنزَلًا مُّبَارَكًا وَأَنتَ خَيْرُ الْمُنزِلِينَ ﴿٢٩﴾ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَاتٍ وَإِن كُنَّا لَمُبْتَلِينَ ﴿٣٠﴾ ثُمَّ أَنشَأْنَا مِن بَعْدِهِمْ قَرْنًا آخَرِينَ ﴿٣١﴾ فَأَرْسَلْنَا فِيهِمْ رَسُولًا مِّنْهُمْ أَنِ اعْبُدُوا اللَّهَ مَا لَكُم مِّنْ إِلَٰهٍ غَيْرُهُ ۖ أَفَلَا تَتَّقُونَ ﴿٣٢﴾ وَقَالَ الْمَلَأُ مِن قَوْمِهِ الَّذِينَ كَفَرُوا وَكَذَّبُوا بِلِقَاءِ الْآخِرَةِ وَأَتْرَفْنَاهُمْ فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا مَا هَٰذَا إِلَّا بَشَرٌ مِّثْلُكُمْ يَأْكُلُ مِمَّا تَأْكُلُونَ مِنْهُ وَيَشْرَبُ مِمَّا تَشْرَبُونَ ﴿٣٣﴾ وَلَئِنْ أَطَعْتُم بَشَرًا مِّثْلَكُمْ إِنَّكُمْ إِذًا لَّخَاسِرُونَ ﴿٣٤﴾ أَيَعِدُكُمْ أَنَّكُمْ إِذَا مِتُّمْ وَكُنتُمْ تُرَابًا وَعِظَامًا أَنَّكُم مُّخْرَجُونَ ﴿٣٥﴾ ۞ هَيْهَاتَ هَيْهَاتَ لِمَا تُوعَدُونَ ﴿٣٦﴾ إِنْ هِيَ إِلَّا حَيَاتُنَا الدُّنْيَا نَمُوتُ وَنَحْيَا وَمَا نَحْنُ بِمَبْعُوثِينَ ﴿٣٧﴾ إِنْ هُوَ إِلَّا رَجُلٌ افْتَرَىٰ عَلَى اللَّهِ كَذِبًا وَمَا نَحْنُ لَهُ بِمُؤْمِنِينَ ﴿٣٨﴾ قَالَ رَبِّ انصُرْنِي بِمَا كَذَّبُونِ ﴿٣٩﴾ قَالَ عَمَّا قَلِيلٍ لَّيُصْبِحُنَّ نَادِمِينَ ﴿٤٠﴾ فَأَخَذَتْهُمُ الصَّيْحَةُ بِالْحَقِّ فَجَعَلْنَاهُمْ غُثَاءً ۚ فَبُعْدًا لِّلْقَوْمِ الظَّالِمِينَ ﴿٤١﴾ ثُمَّ أَنشَأْنَا مِن بَعْدِهِمْ قُرُونًا آخَرِينَ ﴿٤٢﴾



(٢٨) جا کاتێک خۆت و ئەوانەی هاوڕێ و یاوەرتن لەسەر کەشتیەکە سوار بوون (ئەی نوح تۆ) ئەوە بڵێ: سوپاس و ستایش بۆ ئەو خوایەی کە ڕزگاری کردین لە دەست قەومی ستەمکار.

(٢٩) هەروەها بڵێ: پەروەردگارا لە شوێنێکی موبارەک و پیرۆز دامبەزێنە، چونکە تۆ چاکترین زاتێکی بۆ ئەوەی لە شوێنی موبارەک و پیرۆزدا دامانبەزێنیت (ئیتر کەشتیەکە لەسەر کێوی جودی لە کوردستانی باکور لەنگەری گرت).

(٣٠) بەڕاستی ئا لەو بەسەرهاتەدا چەندەها نیشانە و بەڵگەی ئاشکرا هەیە، بێگومان ئێمە (بەجۆرەها شێوە و لە هەموو سەردەمێکدا) خەڵکی تاقی دەکەینەوە.

(٣١) لەوەودوا لە دوای ئەوان قەوم و نەوەیەکی ترمان بەدیهێنا.

(٣٢) ئینجا پێغەمبەرێکمان هەر لە خۆیان بۆ ڕەوانەکردن، (پێی وتن): تەنها خوا بپەرستن، جگە لەو زاتە خوایەکی ترتان نیە، جا ئەوە لێی ناترسن؟ ئەوە خۆتان لە خەشم و قینی ناپارێزن؟!

(٣٣) ئەوانەی کە بێ باوەڕ بوون لە دەستەی دەسەلاتداری قەومەکەی و بڕوایان بەپێشهاتی قیامەت و زیندوو بوونەوە و لێپرسینەوە نەبوو و لە ژیانی دنیادا لە نازو نیعمەتی زۆر بەهرەوەرمان کردبوون وتیان، ئەم پێغەمبەرە تەنها بەشەرێکە وەک ئێوە، لەو شتانە دەخوات کە ئێوە لێی دەخۆن و لەو شتانە دەخواتەوە کە ئێوە لێی دەخۆنەوە.

(٣٤) جا ئەگەر ملکەچ و فەرمانبەرداری بەشەرێکی وەکو خۆتان ببن، ئەوە بەڕاستی ئیتر ئێوە خەسارەتمەند و زەرەرمەندن!!

(٣٥) ئایا هەڕەشەتان لێدەکات بەوەی کاتێک بمرن و ببنەوە بەخاک و ئێسک، ئێوە دەرئەهێنرێنەوە و زیندوو دەکرێنەوە و لە خاک دەربهێنرێنەوە؟!

(٣٦) دووره و زۆر دووره ئەو هەڕەشەیەی کە لێتان دەکرێت بێتەدی و (زیندوو بکرێنەوە)!!

(٣٧) ژیان تەنها ژیانی ئەم دنیایەمانە و هیچی تر نیە، دەژین و دەمرین و ئێمە زیندوو ناکرێینەوە!!

(٣٨) ئەم پیاوە (مەبەست پێغەمبەرەکەیانە) درۆ بۆ خوا هەڵدەبەستێت، ئێمەش بڕوای پێ ناکەین!!

(٣٩) (ئەمیش وەک نوح)وتی: پەروەردگارا، سەرکەوتنم پێببەخشە چونکە ئەوانە منیان بەدرۆزانی و بڕوایان پێنەکردم.

(٤٠) خوای گەورە فەرمووی: دڵنیابە بەم زووانە پەشیمان دەبنەوە.

(٤١) ئەوسا دەنگێکی بەهێز (دڵی پچڕاندن و مێشکی تەقاندن) کردمانن بە کەف وکوڵ و چیلکە و چەوێڵی سەر ئاو، دەبا لەوەولاترچن قەومی ستەمکار.

(٤٢) پاشان لە دوای ئەوان چەند قەومێکی ترمان هێنایە کایەوە (ساڵەها ژیان و لە نازو نیعمەت بەهرەوەر بوون).

مَا تَسْبِقُ مِنْ أُمَّةٍ أَجَلَهَا وَمَا يَسْتَـْٔخِرُونَ ﴿٤٣﴾ ثُمَّ أَرْسَلْنَا رُسُلَنَا تَتْرَا كُلَّ مَا جَآءَ أُمَّةً رَّسُولُهَا كَذَّبُوهُ فَأَتْبَعْنَا بَعْضَهُم بَعْضًا وَجَعَلْنَٰهُمْ أَحَادِيثَ فَبُعْدًا لِّقَوْمٍ لَّا يُؤْمِنُونَ ﴿٤٤﴾ ثُمَّ أَرْسَلْنَا مُوسَىٰ وَأَخَاهُ هَٰرُونَ بِـَٔايَٰتِنَا وَسُلْطَٰنٍ مُّبِينٍ ﴿٤٥﴾ إِلَىٰ فِرْعَوْنَ وَمَلَإِيْهِۦ فَٱسْتَكْبَرُوا۟ وَكَانُوا۟ قَوْمًا عَالِينَ ﴿٤٦﴾ فَقَالُوٓا۟ أَنُؤْمِنُ لِبَشَرَيْنِ مِثْلِنَا وَقَوْمُهُمَا لَنَا عَٰبِدُونَ ﴿٤٧﴾ فَكَذَّبُوهُمَا فَكَانُوا۟ مِنَ ٱلْمُهْلَكِينَ ﴿٤٨﴾ وَلَقَدْ ءَاتَيْنَا مُوسَى ٱلْكِتَٰبَ لَعَلَّهُمْ يَهْتَدُونَ ﴿٤٩﴾ وَجَعَلْنَا ٱبْنَ مَرْيَمَ وَأُمَّهُۥٓ ءَايَةً وَءَاوَيْنَٰهُمَآ إِلَىٰ رَبْوَةٍ ذَاتِ قَرَارٍ وَمَعِينٍ ﴿٥٠﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلرُّسُلُ كُلُوا۟ مِنَ ٱلطَّيِّبَٰتِ وَٱعْمَلُوا۟ صَٰلِحًا إِنِّى بِمَا تَعْمَلُونَ عَلِيمٌ ﴿٥١﴾ وَإِنَّ هَٰذِهِۦٓ أُمَّتُكُمْ أُمَّةً وَٰحِدَةً وَأَنَا۠ رَبُّكُمْ فَٱتَّقُونِ ﴿٥٢﴾ فَتَقَطَّعُوٓا۟ أَمْرَهُم بَيْنَهُمْ زُبُرًا كُلُّ حِزْبٍۭ بِمَا لَدَيْهِمْ فَرِحُونَ ﴿٥٣﴾ فَذَرْهُمْ فِى غَمْرَتِهِمْ حَتَّىٰ حِينٍ ﴿٥٤﴾ أَيَحْسَبُونَ أَنَّمَا نُمِدُّهُم بِهِۦ مِن مَّالٍ وَبَنِينَ ﴿٥٥﴾ نُسَارِعُ لَهُمْ فِى ٱلْخَيْرَٰتِ بَل لَّا يَشْعُرُونَ ﴿٥٦﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ هُم مِّنْ خَشْيَةِ رَبِّهِم مُّشْفِقُونَ ﴿٥٧﴾ وَٱلَّذِينَ هُم بِـَٔايَٰتِ رَبِّهِمْ يُؤْمِنُونَ ﴿٥٨﴾ وَٱلَّذِينَ هُم بِرَبِّهِمْ لَا يُشْرِكُونَ ﴿٥٩﴾

(٤٣) هەر میللەتێک کاتێک بڕیاری لەناو بردنی دەدرێت، ئەو بڕیارە نـە پێش دەکـەوێت و نـە دوا دەخرێت بەڵکو لەکات و ساتی خۆیدا روودەدات.

(٤٤) پاشان پێغەمبـەرانی خۆمانمـان یـەک بـە دوای یەکدا رەوانەکرد، هـەر ئوممـەتێک کـاتێک پێغەمبەری لە خۆی بـۆ رەوانـە دەکـرا (زۆربـەیان بەرنامەکـەیان) بـەدرۆدەزانی، ئێمـەش ئـەو میللەتانـەمان بەشـوێن یـەکدا (لـەناوبرد) و کردمانن بەباس و خواسی ناو خـەڵکی و (پـەندو عیبرەت)، دەبـا ئـەو کەسانەی بـاوەڕ نـاهێنن، لەوەولاترچن.

(٤٥) پاشان موساو هاروونی برایمان رەوانە کـرد هاوڕێ لەگەڵ نیشانەو بەڵگـەو موعجیزەکانمـاندا و بەڵگەی بـەهێزمان پێبەخشـین (لەسـەر راسـتی پەیامەکەیان)...

(٤٦) بۆ سەر فیرعەون و دارو دەستەکەی، کەچی خۆیان بەگـەورەزانـی و قـەومێکـی لـووت بـەرز بوون

(٤٧) (فیرعەون و دارو دەستەکەی) وتیـان: ئایـا رەوایە ئێمە بـاوەڕ بـە دوو بەشـەری وەک خۆمـان بکـەین، لـەکاتێکدا کـە قەومەکـەیان ئێمـە دەپەرستن و (خزمەتکاری ئێمەن).

(٤٨) (دوای چەندەها سـاڵ لـە هـەوڵ و کۆششـی ئەو دوو پێغەمبـەرە) هـەر باوەڕیـان پێنـەکردن و بەدرۆیان زانین، بۆیە چونە ریزی تیاچووەکانەوە.

(٤٩) سـوێند بـەخوا بێگومـان ئێمـە تـەوراتمان بەخشی بەموسا بۆئەوەی قـەومـەکـەی رێبـازی هـیدایـەت بـگرنـەبـەر.

(٥٠) هەروەها کوڕەکەی مەریەم و دایکیمـان کـردە بەڵگـەو نیشـانە(لەسـەر توانـایی خۆمـان) و ئێمـە هـەردووکیانمان حەوانەوە لە شوێنێکی بڵند و خۆش و سازگار و ئاودارادا.

(٥١) ئینجا وتمان: ئەی گرۆی پێغەمبەران، بخۆن لە رزق و رۆزیە چاک و پاکەکان، کاروکردەوەی چاکیش ئەنجام بدەن، بەڕاستی من زانام بە هەموو ئەو کارو کردەوانەی کە دەیکەن.

(٥٢) هەر ئەمەشـە دیـن و ئـاین و بەرنامـەی تـاکو تەنـهای ئێـوە، (بەرنامـەی یەکخواناسـی) و مـن پـەروەردگارتانم، پارێزکاربن و خۆتان لە نافەرمانی من بپارێزن.

(٥٣) بەڵام زۆربەی خەڵکی بیرو بۆچوونی خۆیان بەش بەش و پارچە پارچـە کـرد (لـە بەرنامـەی یەکخواناسـی لایـاندا)، هەموو دەستە و تاقمێک بەو بەرنامە و نەخشەیەی هەیانە دڵخۆشن.

(٥٤) جا وازیان لێ بهێنە با تاماوەیەک لە گومڕایی و سەرلێ شێواویی و سەرگەردانی خۆیاندا گیربخۆن.

(٥٥) ئایا ئەوانە وادەزانن کە ئەو ماڵ و سامان و نەوەیەی پێیان دەبەخشین؟! (هۆی ئەوەیە خۆشمان دەوێن)!!

(٥٦) نەخێر، وانی‌یە، مەبەستمانە بەپەلە لە نازو نیعمەت بەهرەوەریان بکەین؟ بەڵکو ئەوانە هەستی پێ ناکەن.

(٥٧) بەڕاستی ئەوانەی کە ترسی پەروەردگاریان لە دڵدایە و دەترسن لێیان بڕەنجێت...

(٥٨) ئەوانەش بڕوا بە ئایەت و فەرمانەکانی پەروەردگاریان دەهێنن...

(٥٩) ئەوانەش کە هاوەڵ و هاوبەش و شەریک بۆ پەروەردگاریان بڕیار نادەن...

وَٱلَّذِينَ يُؤْتُونَ مَآ ءَاتَواْ وَّقُلُوبُهُمْ وَجِلَةٌ أَنَّهُمْ إِلَىٰ رَبِّهِمْ رَٰجِعُونَ ﴿٦٠﴾ أُوْلَٰٓئِكَ يُسَٰرِعُونَ فِي ٱلْخَيْرَٰتِ وَهُمْ لَهَا سَٰبِقُونَ ﴿٦١﴾ وَلَا نُكَلِّفُ نَفْسًا إِلَّا وُسْعَهَا وَلَدَيْنَا كِتَٰبٌ يَنطِقُ بِٱلْحَقِّ وَهُمْ لَا يُظْلَمُونَ ﴿٦٢﴾ بَلْ قُلُوبُهُمْ فِي غَمْرَةٍ مِّنْ هَٰذَا وَلَهُمْ أَعْمَٰلٌ مِّن دُونِ ذَٰلِكَ هُمْ لَهَا عَٰمِلُونَ ﴿٦٣﴾ حَتَّىٰٓ إِذَآ أَخَذْنَا مُتْرَفِيهِم بِٱلْعَذَابِ إِذَا هُمْ يَجْـَٔرُونَ ﴿٦٤﴾ لَا تَجْـَٔرُواْ ٱلْيَوْمَ إِنَّكُم مِّنَّا لَا تُنصَرُونَ ﴿٦٥﴾ قَدْ كَانَتْ ءَايَٰتِي تُتْلَىٰ عَلَيْكُمْ فَكُنتُمْ عَلَىٰٓ أَعْقَٰبِكُمْ تَنكِصُونَ ﴿٦٦﴾ مُسْتَكْبِرِينَ بِهِۦ سَٰمِرًا تَهْجُرُونَ ﴿٦٧﴾ أَفَلَمْ يَدَّبَّرُواْ ٱلْقَوْلَ أَمْ جَآءَهُم مَّا لَمْ يَأْتِ ءَابَآءَهُمُ ٱلْأَوَّلِينَ ﴿٦٨﴾ أَمْ لَمْ يَعْرِفُواْ رَسُولَهُمْ فَهُمْ لَهُۥ مُنكِرُونَ ﴿٦٩﴾ أَمْ يَقُولُونَ بِهِۦ جِنَّةٌۢ بَلْ جَآءَهُم بِٱلْحَقِّ وَأَكْثَرُهُمْ لِلْحَقِّ كَٰرِهُونَ ﴿٧٠﴾ وَلَوِ ٱتَّبَعَ ٱلْحَقُّ أَهْوَآءَهُمْ لَفَسَدَتِ ٱلسَّمَٰوَٰتُ وَٱلْأَرْضُ وَمَن فِيهِنَّ بَلْ أَتَيْنَٰهُم بِذِكْرِهِمْ فَهُمْ عَن ذِكْرِهِم مُّعْرِضُونَ ﴿٧١﴾ أَمْ تَسْـَٔلُهُمْ خَرْجًا فَخَرَاجُ رَبِّكَ خَيْرٌ وَهُوَ خَيْرُ ٱلرَّٰزِقِينَ ﴿٧٢﴾ وَإِنَّكَ لَتَدْعُوهُمْ إِلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ ﴿٧٣﴾ وَإِنَّ ٱلَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ بِٱلْءَاخِرَةِ عَنِ ٱلصِّرَٰطِ لَنَٰكِبُونَ ﴿٧٤﴾

(٦٠) ئەوانەش کە دەبەخشن لە زەکات و خێر دڵیان دەترسێت، ئەوەکو لێیان وەرنەگیرێت، چونکە ئەوانە بێگومانن کە بۆلای پەروەردگاریان دەگەڕێنەوە.

(٦١) ئا ئەوانە بەپەلەن بۆ ئەنجامدانی هەموو چاکەیەک و پێشبڕکێش دەکەن لە چاکەدا.

(٦٢) ئێمە هیچ ئەرکێک نادەین بەسەر هیچ کەسێکدا مەگەر لە چوارچێوەی توانای خۆیدا، جا ئێمە دۆسیەی تایبەتی هەموو کەسێکمان لایە کە حەق گۆیە (گوفتارو کردارەکانی تێدا تۆمار کراوە، لەبەرئەوە) ئەوانە هیچ جۆرە ستەمێکیان لێ ناکرێت.

(٦٣) بەڵام خوانەناسان لەم نەخشە و بەرنامە و چاکەخوازیانە سەریان دەرناچێت و تێی ناگەن، کارو کردەوەی تریشیان هەیە(جیایە لە کردەی ئیمانداران) بەردەوام ئەنجامی دەدەن.

(٦٤) هەتا ئەوکاتەی بەڵابەسەر خۆشگوزەران و دەوڵەمەندەکانیاندا دەهێنین، دەستبەجێ ئیتر ناهو ناڵەو گریە و زاریان لێ بەرز دەبێتەوە.

(٦٥) (لەقیامەتیشدا پێیان دەوترێت) ئەمڕۆ ئیتر ئێوە چرکەتان لێوە نەیەت و هاوار نەکەن، چونکە بێگومان ئێوە لەلایەن ئێمەوە هیچ جۆرە پشتگیریەکتان لێ ناکرێت.

(٦٦) جا ئێوە کاتی خۆی ئایەتەکانی ئێمەتان بەسەردا دەخوێنرایەوە کەچی پشتتان تێدەکردو بەرەودوا دەگەڕانەوەو خۆتان لێ دەشاردەوە و دژایەتیتان دەکرد.

(٦٧) لەکاتێکدا خۆتان بە گەورە دەزانی لە ئاستیدا، شەوگاریشتان بە باس و خواس و گاڵتە پێکردنی ئایەتەکانی ئێمە دەبردە سەر.

(٦٨) ئایا (بێ باوەڕان) ئەم گوفتارەیان لێک نەداوەتەوە، یاخود وادەزانن ئەم بەرنامەیەی کە بۆ ئەوان ڕەوانەکراوە بۆ باوو باپیرانی دێرینیان ڕەوانە نەکراوە؟!

(٦٩) یان ئەوەیە پێغەمبەرەکەیان نەناسیوە و ئەوە بۆتە هۆی ئەوەی بڕوا بەپەیامەکەی نەکەن و دژی بوەستن!!

(٧٠) یاخود (بێ شەرمانە) دەڵێن: شێتی سەری لێداوە، نەخێر، وانیە، بەڵکو ڕاستی و حەقی بۆ هێناون، بەڵام زۆربەیان ڕقیان لە ڕاستیە و حەز لە حەق ناکەن و پێی سەغڵەتن.

(٧١) ئەگەر حەق و ڕاستی شوێنی ئارەزووی ئەوان بکەوێت، ئەوە ئاسمانەکان و زەوی و هەموو ئەوانەی تیایاندایە دەشێواو تیادەچوو سەرگەردان دەبوو، نەخێر (حەق وایە ڕقیان لێی نەبێت)، چونکە ئێمە قورئانێکمان بۆ هێناون (کە یادی هەموو چاکەیەکیان بخاتەوە، کەچی ئەوان لەبەرامبەر ئەو یادخەرەوانەدا سەرکەش و یاخین و پشتی تێدەکەن.

(٧٢) ئاخۆ داوای خەرجی و پارە لەوانە دەکەیت (لە بەرامبەر هیدایەتیانەوە تا لایان سەنگین بێت؟ بۆیە باوەڕ ناهێنن؟) خۆ بەخششی پەروەردگارت بەسوودتر و چاکترە، ئەو زاتە چاکترین زاتێکە بۆ بەخشینی ڕزق و ڕۆزی.

(٧٣) بێگومان تۆ بانگیان دەکەیت بۆ ڕێگە و ڕێبازێکی ڕاست و دروست.

(٧٤) بەڕاستی ئەوانەی بڕوا ناهێنن بەقیامەت وێڵ و لادەرن لە ڕێگە و ڕێبازی ڕاست.



﴿۞ وَلَوْ رَحِمْنَٰهُمْ وَكَشَفْنَا مَا بِهِم مِّن ضُرٍّ لَّلَجُّواْ فِي طُغْيَٰنِهِمْ يَعْمَهُونَ ٧٥ وَلَقَدْ أَخَذْنَٰهُم بِٱلْعَذَابِ فَمَا ٱسْتَكَانُواْ لِرَبِّهِمْ وَمَا يَتَضَرَّعُونَ ٧٦ حَتَّىٰٓ إِذَا فَتَحْنَا عَلَيْهِم بَابًا ذَا عَذَابٍ شَدِيدٍ إِذَا هُمْ فِيهِ مُبْلِسُونَ ٧٧ وَهُوَ ٱلَّذِيٓ أَنشَأَ لَكُمُ ٱلسَّمْعَ وَٱلْأَبْصَٰرَ وَٱلْأَفْـِٔدَةَ قَلِيلًا مَّا تَشْكُرُونَ ٧٨ وَهُوَ ٱلَّذِي ذَرَأَكُمْ فِي ٱلْأَرْضِ وَإِلَيْهِ تُحْشَرُونَ ٧٩ وَهُوَ ٱلَّذِي يُحْيِۦ وَيُمِيتُ وَلَهُ ٱخْتِلَٰفُ ٱلَّيْلِ وَٱلنَّهَارِ أَفَلَا تَعْقِلُونَ ٨٠ بَلْ قَالُواْ مِثْلَ مَا قَالَ ٱلْأَوَّلُونَ ٨١ قَالُوٓاْ أَءِذَا مِتْنَا وَكُنَّا تُرَابًا وَعِظَٰمًا أَءِنَّا لَمَبْعُوثُونَ ٨٢ لَقَدْ وُعِدْنَا نَحْنُ وَءَابَآؤُنَا هَٰذَا مِن قَبْلُ إِنْ هَٰذَآ إِلَّآ أَسَٰطِيرُ ٱلْأَوَّلِينَ ٨٣ قُل لِّمَنِ ٱلْأَرْضُ وَمَن فِيهَآ إِن كُنتُمْ تَعْلَمُونَ ٨٤ سَيَقُولُونَ لِلَّهِ قُلْ أَفَلَا تَذَكَّرُونَ ٨٥ قُلْ مَن رَّبُّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ ٱلسَّبْعِ وَرَبُّ ٱلْعَرْشِ ٱلْعَظِيمِ ٨٦ سَيَقُولُونَ لِلَّهِ قُلْ أَفَلَا تَتَّقُونَ ٨٧ قُلْ مَنۢ بِيَدِهِۦ مَلَكُوتُ كُلِّ شَيْءٍ وَهُوَ يُجِيرُ وَلَا يُجَارُ عَلَيْهِ إِن كُنتُمْ تَعْلَمُونَ ٨٨ سَيَقُولُونَ لِلَّهِ قُلْ فَأَنَّىٰ تُسْحَرُونَ ٨٩﴾

(٧٥) خۆ ئەگەر بەزەییمان پیایاندا بێتەوە و رەحمیان پێ بکەین و ناخۆشی و سەغڵەتییان لەسەر لابەرین، ئەوە لە ستەم و سەرکەشیاندا رۆدەچن و سەرگەردان دەبن.

(٧٦) سوێند بەخوا بەڕاستی ئێمە تووشی سزاو ئازاری (جۆراو جۆرمان) کردن، کەچی لەگەڵ ئەوەشدا ئەملکەچ بوون بۆ پەروەردگاریان و نە لێیی دەپاڕێنەوە.

(٧٧) هەتا ئەوکاتەی کە دەروازەی سزایەکی سەختیان لێ دەکەینەوە، ئیتر دەستبەجێ لەناویدا سەرگەردان و سەرلێشێواو نائومێد دەبن.

(٧٨) هەر ئەو زاتەیە کە (دەزگای) بیستن و بینین و لێکدانەوەی پێ بەخشیوون، کەچی زۆر کەمتان سوپاسگوزارن.

(٧٩) ئەو زاتەیە لە زەویدا بەرپای کردوون و بڵاوی کردوونەتەوە، سەرەنجام (لەرۆژی قیامەتدا) هەر بۆ لای ئەویش کۆدەکرێنەوە.

(٨٠) ئەو زاتەشە کە ژیان دەبەخشێت و مردن پێش دەهێنێت، گۆڕینی شەو و ڕۆژیش هەر بە دەست ئەوە (لە رووی تاریکی و رووناکی، کورتی و درێژی و..هتد)، جا ئایا ئێوە عەقڵ بەکار ناهێنن؟ ژیریتان ناخەنەکار؟

(٨١) لەگەڵ ئەو هەموو بەڵگانەدا ئەوانە هەر وەکو خەڵکی پێشین قسە کۆنەکان دەڵێنەوە و..

(٨٢) دەڵێن: باشە، ئەگەر مردین و بووینە خاک و خۆڵ و ئێسک ئایا ئێمە دووبارە زیندوو دەکرێینەوە؟!

(٨٣) بەڕاستی ئێمە و باوو باپیرانمان لەم جۆرە بەڵێنانەمان پێشتر پێدرابوو، ئەم قسە و بەڵێنانە داستانی پێشینەکانە!!

(٨٤) تۆش پێیان بڵێ: باشە زەوی و ئەو کەسانەی کە لەسەری دەژین کێ خاوەنیانە، ئەگەر زیرەک وهوشیارن؟ ئەگەر شت دەزانن؟!

(٨٥) سەرئەنجام هەر دان بەڕاستیدا دەنێن و دەڵێن: هەر خوا، خاوەنیانە، هەر پەروەردگار بەدیهێنەریانە، ئەوسا پێیان بڵێ: جا ئەوە بۆچی یاداوەری وەرناگرن؟

(٨٦) پێیان بڵێ: ئەی کێ پەروەردگاری حەوت ئاسمانەکەیە و کێ پەروەردگاری عەرش و تەختی فەرمانڕەوایی گەورە و فراوانە؟ (ئاسمانەکان و زەوی لە بەرامبەر عەرشی پەروەردگاردا، وەکو ئەڵقەیەکی پەنجە وایە لەپاڵ چیایەکی گەورەدا).

(٨٧) سەرەنجام دەڵێن: هەر خوا پەروەردگاریانە، ئەوسا بڵێ: باشە ئاخر ئێوە لێی ناترسن؟ خۆتان ناپارێزن لە خەشم و قینی؟ (ئاخر ئێوە لە کێ یاخی دەبن؟)

(٨٨) (هەروەها پێیان) بڵێ: کێ جڵەوی هەموو شتێکی بەدەستە، لەکاتێکدا هەر ئەو پەنا بەخشەو کەس ناتوانێت لە سزای ئەو زاتە، کەس پەنا بدات، ئەگەر ئێوە بزانن و شارەزا بن.

(٨٩) (سەرەنجام بۆ ئەمەش) دەڵێن: هەموو ئەوانە بەدەست خوایە، تۆش بڵێ: کەواتە چۆن جادووتان لێ دەکرێت؟ کە ئەمە دەزانن.

بَلْ أَتَيْنَٰهُم بِٱلْحَقِّ وَإِنَّهُمْ لَكَٰذِبُونَ ﴿٩٠﴾ مَا ٱتَّخَذَ ٱللَّهُ مِن وَلَدٍ
وَمَا كَانَ مَعَهُۥ مِنْ إِلَٰهٍ ۚ إِذًا لَّذَهَبَ كُلُّ إِلَٰهٍۭ بِمَا خَلَقَ وَلَعَلَا
بَعْضُهُمْ عَلَىٰ بَعْضٍ ۚ سُبْحَٰنَ ٱللَّهِ عَمَّا يَصِفُونَ ﴿٩١﴾ عَٰلِمِ
ٱلْغَيْبِ وَٱلشَّهَٰدَةِ فَتَعَٰلَىٰ عَمَّا يُشْرِكُونَ ﴿٩٢﴾ قُل رَّبِّ
إِمَّا تُرِيَنِّى مَا يُوعَدُونَ ﴿٩٣﴾ رَبِّ فَلَا تَجْعَلْنِى فِى ٱلْقَوْمِ
ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٩٤﴾ وَإِنَّا عَلَىٰٓ أَن نُّرِيَكَ مَا نَعِدُهُمْ لَقَٰدِرُونَ ﴿٩٥﴾
ٱدْفَعْ بِٱلَّتِى هِىَ أَحْسَنُ ٱلسَّيِّئَةَ ۚ نَحْنُ أَعْلَمُ بِمَا يَصِفُونَ ﴿٩٦﴾
وَقُل رَّبِّ أَعُوذُ بِكَ مِنْ هَمَزَٰتِ ٱلشَّيَٰطِينِ ﴿٩٧﴾ وَأَعُوذُ بِكَ
رَبِّ أَن يَحْضُرُونِ ﴿٩٨﴾ حَتَّىٰٓ إِذَا جَآءَ أَحَدَهُمُ ٱلْمَوْتُ قَالَ رَبِّ
ٱرْجِعُونِ ﴿٩٩﴾ لَعَلِّىٓ أَعْمَلُ صَٰلِحًا فِيمَا تَرَكْتُ ۚ كَلَّآ ۚ إِنَّهَا كَلِمَةٌ
هُوَ قَآئِلُهَا ۖ وَمِن وَرَآئِهِم بَرْزَخٌ إِلَىٰ يَوْمِ يُبْعَثُونَ ﴿١٠٠﴾ فَإِذَا نُفِخَ
فِى ٱلصُّورِ فَلَآ أَنسَابَ بَيْنَهُمْ يَوْمَئِذٍ وَلَا يَتَسَآءَلُونَ ﴿١٠١﴾
فَمَن ثَقُلَتْ مَوَٰزِينُهُۥ فَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُفْلِحُونَ ﴿١٠٢﴾ وَمَنْ
خَفَّتْ مَوَٰزِينُهُۥ فَأُو۟لَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ خَسِرُوٓا۟ أَنفُسَهُمْ فِى جَهَنَّمَ
خَٰلِدُونَ ﴿١٠٣﴾ تَلْفَحُ وُجُوهَهُمُ ٱلنَّارُ وَهُمْ فِيهَا كَٰلِحُونَ ﴿١٠٤﴾

(٩٠) نەخێر وانی‌یە، بەڵکو ئێمە حەقیقەت و راستیمان بۆ هێناون، بەڕاستی نەفامان هەمیشە درۆزنن.

(٩١) هەرگیز خوا کەسی نەکردووە بەرۆڵەی خۆی و هیچ خوایەکی لەگەڵدا نی‌یە، چونکە ئەو کاتە هەر خوایەک دەچوو بەلای دروستکراوانی خۆیەوە و هەندێکی خۆی بڵند دەکرد بەسەر هەندێکی تردا (ئەوسا بوونەوەر تێکدەچوو)، پاکی و بێگەردی بۆ زاتی خوایە لەبەرامبەر ئەوشتانەوە کە(خوانەناسان) هەڵی دەبەستن و دەیڵێن.

(٩٢) (ئەو زاتە) زانای نهێنی و شاراوەکانە، هەروەها زانای دیارو ئاشکراکانە، بەرزی و بڵندی بۆ ئەوە لە بەرامبەر ئەو شتانەوە کە (نەفامان) دەیکەنە شەریک و هاوەڵی.

(٩٣) بڵێ: پەروەردگارا: ئەگەر ئەوەت نیشاندام کە لە تۆڵەی هەڕەشەکانتدا پێت راگەیاندوون...

(٩٤) ئەوکاتە پەروەردگارا مەمخەرە ریزی قەومی ستەمکارەوە.

(٩٥) بێگومان ئێمە دەسەڵاتمان هەیە، ئەو هەڕەشانەی لێمان کردوون پێشی بهێنین و نیشانت بدەین.

(٩٦) هەوڵ بدە بەچاکترین و جوانترین شێوە پاڵ بەهەڵە و نارێکی ناحەزانەوە بنێیت و خەمت نەبێت ئێمە چاک ئاگادارین لە گوفتارو قسەی ناڕەوایان.

(٩٧) (خۆت بسپێرە بەخواو) بڵێ: پەروەردگارا من پەنا دەگرم بە تۆ لە هەموو خەتەرەو خەیاڵ و وەسوەسەی شەیتانەکان.

(٩٨) پەنا دەگرم بە تۆ ئەی پەروەردگارم کە شەیتانەکان بە دەورمدا کۆ ببنەوە و (سەرم لێ بشێوێنن).

(٩٩) (خوانەناسان بەردەوام لەسەر رێبازی چەوتیانن)، هەتا ئەو کاتەی مردن یەخەیان دەگرێت، ئەوسا هەریەکەیان دەڵێت: پەروەردگارا بمگێڕەرەوە بۆ دنیا...

(١٠٠) بەڵکو چاکە ئەنجام بدەم و کاری باشە بکەم و ئەو هەلانەی کە لە دەستم چووە لەمەودوا لە دەستی نەدەم، (بەلام تازە کار لە کار ترازاوە، شتی وامەحاڵە، بۆیە بەتوندی پێی دەوترێت): نەخێر، ئەوە قسەیەکە ئەو بۆ خۆی دەیڵێت، بەڵکو دەبێت لە جیهانی بەرزەخدا، لە نێوان مردن و زیندوو بوونەوەدا تا کاتێک زیندوو دەکرێنەوە چاوەڕێ بێت.

(١٠١) جا کاتێک فوو دەکرێت بە ـ صور ـ دا ئەوە هیچ پەیوەندیەکی خزمایەتی لەو رۆژەدا نی‌یە و کەس لە کەس ناپرسێتەوە.

(١٠٢) ئەو کەسەی تەرازووی چاکەکانی قورس بێت، ئا ئەوانە سەرفرازو سەرکەوتوون.

(١٠٣) بەڵام ئەو کەسەی تەرازووی چاکەکانی سووک بێت، ئەوانە ئەو کەسانەن خۆیان لە دەستداوە و خۆیان خەسارو ریسوا کردووە، دەبێت هەر لەناو دۆزەخدا ژیانی نەبڕاوە ببەنە سەر.

(١٠٤) بڵێسەی ئاگر چرووچاویان دەبرژێنێت، هەموویان لێویان هەڵقرچاوە و دانیان ریچ دەبێتەوە (دیمەنیان سامناکە).

أَلَمْ تَكُنْ ءَايَٰتِي تُتْلَىٰ عَلَيْكُمْ فَكُنتُم بِهَا تُكَذِّبُونَ ﴿١٠٥﴾ قَالُوا۟ رَبَّنَا غَلَبَتْ عَلَيْنَا شِقْوَتُنَا وَكُنَّا قَوْمًا ضَآلِّينَ ﴿١٠٦﴾ رَبَّنَآ أَخْرِجْنَا مِنْهَا فَإِنْ عُدْنَا فَإِنَّا ظَٰلِمُونَ ﴿١٠٧﴾ قَالَ ٱخْسَـُٔوا۟ فِيهَا وَلَا تُكَلِّمُونِ ﴿١٠٨﴾ إِنَّهُۥ كَانَ فَرِيقٌ مِّنْ عِبَادِي يَقُولُونَ رَبَّنَآ ءَامَنَّا فَٱغْفِرْ لَنَا وَٱرْحَمْنَا وَأَنتَ خَيْرُ ٱلرَّٰحِمِينَ ﴿١٠٩﴾ فَٱتَّخَذْتُمُوهُمْ سِخْرِيًّا حَتَّىٰٓ أَنسَوْكُمْ ذِكْرِي وَكُنتُم مِّنْهُمْ تَضْحَكُونَ ﴿١١٠﴾ إِنِّي جَزَيْتُهُمُ ٱلْيَوْمَ بِمَا صَبَرُوٓا۟ أَنَّهُمْ هُمُ ٱلْفَآئِزُونَ ﴿١١١﴾ قَٰلَ كَمْ لَبِثْتُمْ فِي ٱلْأَرْضِ عَدَدَ سِنِينَ ﴿١١٢﴾ قَالُوا۟ لَبِثْنَا يَوْمًا أَوْ بَعْضَ يَوْمٍ فَسْـَٔلِ ٱلْعَآدِّينَ ﴿١١٣﴾ قَٰلَ إِن لَّبِثْتُمْ إِلَّا قَلِيلًا لَّوْ أَنَّكُمْ كُنتُمْ تَعْلَمُونَ ﴿١١٤﴾ أَفَحَسِبْتُمْ أَنَّمَا خَلَقْنَٰكُمْ عَبَثًا وَأَنَّكُمْ إِلَيْنَا لَا تُرْجَعُونَ ﴿١١٥﴾ فَتَعَٰلَى ٱللَّهُ ٱلْمَلِكُ ٱلْحَقُّ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ رَبُّ ٱلْعَرْشِ ٱلْكَرِيمِ ﴿١١٦﴾ وَمَن يَدْعُ مَعَ ٱللَّهِ إِلَٰهًا ءَاخَرَ لَا بُرْهَٰنَ لَهُۥ بِهِۦ فَإِنَّمَا حِسَابُهُۥ عِندَ رَبِّهِۦٓ إِنَّهُۥ لَا يُفْلِحُ ٱلْكَٰفِرُونَ ﴿١١٧﴾ وَقُل رَّبِّ ٱغْفِرْ وَٱرْحَمْ وَأَنتَ خَيْرُ ٱلرَّٰحِمِينَ ﴿١١٨﴾

سُورَةُ النُّورِ

(١٠٥) (ئەوسا خوا پرسیاریان لیٚ دەکات) ئایا کـاتی خۆی ئایەتـەکانی مـن بەسـەرتاندا نـە دەخوێنرایەوە، کەچی ئێوە  بڕواتـان پێـی نـەبوو، بە درۆتان دەزانی؟

(١٠٦) (سـەرەنجام بەکساسـیـەوە) دەڵێـن: پـەروەردگارا نەگبـەتی و نەهامـەتی سەرشـانی گرتین و زاڵ بـوو بەسـەرماندا ئێـمـە کسـانێـکی گومرابووین.

(١٠٧) پـەروەردگارا لــەناو ئـاگری دۆزەخ و سزاکەیدا دەرمـان بهێنـە ئەگـەر جـارێکی تـر گەڕاینەوە (بۆ گومڕایی) ئـەوە ئیـتر دیـارە کـە ئێمە کەسانێکی ستەمکارین.

(١٠٨) (خـوای گـەورە لـە وەڵامیـاندا بـە تووڕەییـەوە) دەفـەرموێت: بـێ دەنـگ بـن و دەمتان داخەن، قسەشم لەگەڵدا مەکەن.

(١٠٩) چونکە بەڕاستی کاتی خۆی دەسـتەیەك لە بـەندە ئیماندارەکـانم دەیـانوت: پـەروەردگارا ئێمە ئیمـان و بـاوەڕی دامـەزراومان بـەزاتی تـۆ هێنـاوە، دە، لێمـان خـۆش ببـە و رەحمـان پـێ بکە چونکە تۆ چاکترین زاتێکی کـە لـە هـەموو خاوەن رەحم و سۆزەکان میهرەبانتریت.

(١١٠) کەچی ئێوە گاڵتـەتان پێدەکردن، هـەتا گەیشتە رادەیەك یادی منیان لە بـیر بردنـەوە و ئێوە بەردەوام بەوان پێدەکەنین.

(١١١) (جا با بزانن کە) بێگومان ئـەمڕۆ مـن پاداشتم داونەتەوە بەهۆی ئەوەوە کە خۆگربـوون، بەڕاستی هەر ئەوانیش سەرکەوتوو سەرفرازن.

(١١٢) (ئەوسا خوای گەورە) لێیان دەپرسێت: ئەوە چەند ساڵ لە زەویدا ژیانتان بردە سەر.

(١١٣) (دۆزەخییان) دەڵێن: رۆژێك یان کەمترلە رۆژێك (دیارەکە ژیانی دنیا لەچاو ژیانی نەبڕاوە و هەمیشـەییدا زۆر کورت و کۆتاو کەم دێتە بەرچاو، یاخود جیهانی بەرزەخ وەکـو رۆژێـك یـان کـەمتر هەسـتی پـێ دەکرێـت)، لـەو کەسانە بپرسن کە بیرو هۆشیان لای خۆیانە و حسابی ژمارە و کات دەکەن.

(١١٤) (خوای گـەورە پێیـان) دەفـەرموێت: لـە ڕاسـتیدا مـانـەوەتـان لـە دنیـادا هـەر زۆر کـەم بـووە، ئەگـەر بەڕاستی دەتانزانی؟

(١١٥) ئایا گومانتان وادەبرد کـە بەڕاسـتی ئێمـە ئێوەمـان بـەبێ مەبەسـت دروسـت کـردووە و ئێـوە بـۆ لای ئێمـە ناهێنرێنەوە؟!

(١١٦) بەرزی و بڵندی بۆ خوا، پاشای رەوای حەق، هیچ خوایـەك نیـە جگـە لـەو زاتـە، خـاوەنی عـەرشـی شـکۆدارو بەرێزە.

(١١٧) ئەو کەسەی خوایەکی تر بڕیار بدات و بیکاتە شەریکی خوا، لەکاتێکدا کە هیچ بەڵگەیەکی بەدەستەوە نیـە، ئەوە بەڕاستی حساب و لێپرسینەوەی لای پەروەردگارێتی، بێگومان بێ باوەڕ و خوانەناسان سەرفەراز نابن.

(١١٨) (ئەی محمدﷺ، ئەی ئیماندار! تۆ) بڵێ: پەروەردگارا: لـە گونـاهو هەڵـەکانم خـۆش ببـە و رەحـم پـێ بکـە چونکە تۆ لە هەموو میهرەبانان میهرەبانتریت.

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

سُورَةٌ أَنزَلْنَاهَا وَفَرَضْنَاهَا وَأَنزَلْنَا فِيهَا آيَاتٍ بَيِّنَاتٍ لَّعَلَّكُمْ تَذَكَّرُونَ ﴿١﴾ الزَّانِيَةُ وَالزَّانِي فَاجْلِدُوا كُلَّ وَاحِدٍ مِّنْهُمَا مِائَةَ جَلْدَةٍ وَلَا تَأْخُذْكُم بِهِمَا رَأْفَةٌ فِي دِينِ اللَّهِ إِن كُنتُمْ تُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ وَلْيَشْهَدْ عَذَابَهُمَا طَائِفَةٌ مِّنَ الْمُؤْمِنِينَ ﴿٢﴾ الزَّانِي لَا يَنكِحُ إِلَّا زَانِيَةً أَوْ مُشْرِكَةً وَالزَّانِيَةُ لَا يَنكِحُهَا إِلَّا زَانٍ أَوْ مُشْرِكٌ وَحُرِّمَ ذَٰلِكَ عَلَى الْمُؤْمِنِينَ ﴿٣﴾ وَالَّذِينَ يَرْمُونَ الْمُحْصَنَاتِ ثُمَّ لَمْ يَأْتُوا بِأَرْبَعَةِ شُهَدَاءَ فَاجْلِدُوهُمْ ثَمَانِينَ جَلْدَةً وَلَا تَقْبَلُوا لَهُمْ شَهَادَةً أَبَدًا وَأُولَٰئِكَ هُمُ الْفَاسِقُونَ ﴿٤﴾ إِلَّا الَّذِينَ تَابُوا مِن بَعْدِ ذَٰلِكَ وَأَصْلَحُوا فَإِنَّ اللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿٥﴾ وَالَّذِينَ يَرْمُونَ أَزْوَاجَهُمْ وَلَمْ يَكُن لَّهُمْ شُهَدَاءُ إِلَّا أَنفُسُهُمْ فَشَهَادَةُ أَحَدِهِمْ أَرْبَعُ شَهَادَاتٍ بِاللَّهِ إِنَّهُ لَمِنَ الصَّادِقِينَ ﴿٦﴾ وَالْخَامِسَةُ أَنَّ لَعْنَتَ اللَّهِ عَلَيْهِ إِن كَانَ مِنَ الْكَاذِبِينَ ﴿٧﴾ وَيَدْرَأُ عَنْهَا الْعَذَابَ أَن تَشْهَدَ أَرْبَعَ شَهَادَاتٍ بِاللَّهِ إِنَّهُ لَمِنَ الْكَاذِبِينَ ﴿٨﴾ وَالْخَامِسَةَ أَنَّ غَضَبَ اللَّهِ عَلَيْهَا إِن كَانَ مِنَ الصَّادِقِينَ ﴿٩﴾ وَلَوْلَا فَضْلُ اللَّهِ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَتُهُ وَأَنَّ اللَّهَ تَوَّابٌ حَكِيمٌ ﴿١٠﴾

سورەتی (النـور)

بەناوی خوای بەخشندە و میهرەبان

(١) ئەمە سوورەتێکی گرنگە ئێمە دامانبەزاندووە هەندێک شتمان تیادا فەرز کردووە، چەندەها ئایەت و فەرمانی ئاشکرامان لەتوێیدا دابەزاندووە، بۆ ئەوەی یاداوەریی وەربگرن و تێفکرن.

(٢) سەدقامچی لە هەریەک لە ئافرەت و پیاوی زیناکەر بوەشێنن، بەزەیی نەتانگرێت لە بەجێهێنانی فەرمانی خوادا بۆیان، ئەگەر ئێوە باوەڕتان بە خواو بەرۆژی دوایی هێناوە، بادەستەیەکیش لە ئیمانداران ئامادەی سزاکەیان بن.

(٣) پیاوی زیناکەر تەنها ئافرەتی زیناکەر یاخود موشریک مارە دەکات، ئافرەتی زیناکەریش تەنها پیاوی زیناکەر یاخود موشریک مارەی دەکات، (هاوسەرێتی پیاوان و ئافرەتانێک کە بەردەوامن لەسەر زینا)، ئەوە لەسەر ئیمانداران حەرامکراوە.

(٤) ئەوانەی کە بوختان دەکەن بۆ ئافرەتانی داوێن پاک و خاوەن مێرد، پاشان ناتوانن چوار کەسیش بە شایەت بهێنن، ئەوانە هەشتا قامچیان لێ بدەن و هەرگیز شایەتییان لێ وەرمەگرن، ئەوانە لە ریزی تاوانبارو لە سنوور دەرچوو و یاخیەکاندان.

(٥) جگە لەوانەی کە تەوبەی راستەقینەیان کردووە دوای تەمێ کردنەکەیان، چاکسازی خۆیشیان کردووە، ئەوە بێگومان خوا (بە نیسبەت ئەو جۆرە کەسانەوە) لێخۆشبوو و میهرەبانە.

(٦) ئەوانەی کە تۆمەتی زینا دەدەنە پاڵ هاوسەرەکانیان، هیچ شایەتێکیشیان نیە جگە لە خۆیان، شایەتی ئەو جۆرە کەسانە بەوە دەبێت کە چوار جار سوێند بە خوا بخوات کە بێگومان لە راستگۆیانە (بەچاوی خۆی تاوانەکەی بینیووە).

(٧) پێنجەم جاریش بڵێت بەراستی نەفرینی خوای لەسەرە ئەگەر (بوختانچی بێت) لە درۆزنان بێت.

(٨) (لە لایەکی تریشەوە) سزا لەسەر ژنەکە لا دەبرێت کاتێ کە چوارجار سوێند بە خوا بخوات کە مێردەکەی درۆ دەکات و (بوختانی بۆ هەڵدەبەستێت).

(٩) پێنجەم جار ژنەکە دەڵێت کە خەشم و قینی خوای لەسەرە ئەگەر مێردەکەی راست بکات.

(١٠) خۆ ئەگەر فەزڵ و بەهرەی خواو رەحمەت و میهرەبانی ئەو نەبێت لەسەرتان (تووشی کێشەی زۆر دەبـن) بەراستی خوا تەوبە وەرگر و دانایە (ئەگەر تەوبەی راستەقینە بکەن).

إن الذين جاءو بالإفك عصبة منكم لا تحسبوه شرا لكم بل هو خير لكم لكل امرئ منهم ما اكتسب من الإثم والذي تولى كبره منهم له عذاب عظيم ﴿١١﴾ لولا إذ سمعتموه ظن المؤمنون والمؤمنات بأنفسهم خيرا وقالوا هذا إفك مبين ﴿١٢﴾ لولا جاءو عليه بأربعة شهداء فإذ لم يأتوا بالشهداء فأولئك عند الله هم الكاذبون ﴿١٣﴾ ولولا فضل الله عليكم ورحمته في الدنيا والآخرة لمسكم في ما أفضتم فيه عذاب عظيم ﴿١٤﴾ إذ تلقونه بألسنتكم وتقولون بأفواهكم ما ليس لكم به علم وتحسبونه هينا وهو عند الله عظيم ﴿١٥﴾ ولولا إذ سمعتموه قلتم ما يكون لنا أن نتكلم بهذا سبحانك هذا بهتان عظيم ﴿١٦﴾ يعظكم الله أن تعودوا لمثله أبدا إن كنتم مؤمنين ﴿١٧﴾ ويبين الله لكم الآيات والله عليم حكيم ﴿١٨﴾ إن الذين يحبون أن تشيع الفاحشة في الذين آمنوا لهم عذاب أليم في الدنيا والآخرة والله يعلم وأنتم لا تعلمون ﴿١٩﴾ ولولا فضل الله عليكم ورحمته وأن الله رءوف رحيم ﴿٢٠﴾

(١١) (لێرەوە قورئـان دەربـارەی ئـەو بوختانـە دەدوێت کە بۆ حەزرەتی عائیشـە لەلایـەن دوو ڕووەکانەوە هەڵبەسترا، هەندێک لـە ئیماندارانیش بێ لێکدانەوە و تێفکران دەیانوتەوە).

بێگومـان ئەوانـەی بوختانەکـەیان هەڵبەسـت دەستەیەک بوون لە خۆتان (یاخود واخۆیـان نیشان دەدا کە لەخۆتانن) وامەزانن کە ئەو بوختانە شەڕو خراپ بـوو بۆتـان، بـەڵکو خـێر بـوو بۆتـان (تـا ئیمانداران لە دووڕووەکان جیابێتـەوە، ئیمـاندارانی دڵپاک وریـا ببنـەوە)، بێگومـان تـاوانی هەرکـەس لـەو بوختانچیانـە لەگـەردنی خۆیدایـەتی، ئـەو کەسەش سەرۆک و گەورەو هەڵبەستی بوختانەکەیە، سزایەکی سەخت و گەورە بۆی ئامادەیە.

(١٢) دەبـوا هـەر کـە ئـەو بوختانـەتان بیسـت ئیمانداران لە پیاوان و لە ئافرەتان گومانی چاکیـان بەخۆیان ببوایـە و دڵنیـا بوونایە لـەپاکی خۆیـان و بیانوتایـە ئەمـە بوختانێکی ئاشـکرایە و (کـاری ناڕەوای وا لـە دایکی موسڵمانان و لـە هـاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ ناوەشێتەوە).

(١٣) دەبـوا بوختانچیـەکان چوارشـایەتیان بـۆ سـەلماندنی بوختانەکـەیان بهێنایـە، کـاتێک چـوار شـایەتیان نـەهێنا، ئـەوە ئیتر دیـارە ئەوانـە لای خوایش لە ڕیزی درۆزنەکاندان.

(١٤) خۆ ئەگەر فەزڵ و بەزەیی خـواو بەخشـندەییەکەی نەبوایـە لەسـەرتان لـە دنیـاو قیامـەتدا، بـەهۆی ئـەو تاوانەتانـەوە سزایەکی زۆر گەورە و سەختتان تووش دەبوو، بەهۆی ڕۆچوونتان لەو دەنگ و باسەدا.

(١٥) ئەوە بۆ هەر دەماودەم قسە لە زمانی یەکتر وەردەگرن (بێ لێکدانەوە)، کاتێک بـە زارتـان شـتێک دەڵێـن کـە هیـچ ئاگاییتان دەربارەی نیە، ئێوە وادەزانن ئەو بوختانە شتێکی سادەو ئاسانە؟ لەکاتێکدا ئەوە لای خوا زۆر گەورە و ناقۆڵایە.

(١٦) دەبوا کاتێک گوێتان لەو بوختانە بوو، بتانوتایە: ئێمە بۆمان نی یە قسەی وابکەین، پاکی و بێگەردی بـۆ خـوا، ئـاخر ئەمە بوختانێکی زۆر گەورە و ناقۆڵایە (کەی ئەوە لە دایکی ئیمانداران دەوەشێتەوە).

(١٧) خوا ئامۆژگاریتان دەکات کە ئەکەن هەرگیز شتی ئاوا دووبارە بکەنەوە ئەگەر ئێوە ئیماندارن.

(١٨) خوا ئایەت و فەرمان و ڕێنموویەکانی ڕوون دەکاتەوە بۆتان (تایەکتر لەکەدار نەکەن)، بێگومان خوا زاناو دانایە.

(١٩) بەڕاستی ئەوانەی حەز دەکەن زیناو تاوان لەناو ئەوانەدا باوەڕیان هێناوە بڵاوبێتەوە، سزای پڕ ئێش و ئازار لەم جیهان و لەو جیهان بۆیان ئامادەیە و خوا خۆی چاک دەزانێت (سەرەنجامی زینا و شەڕوالپیسی بەرەوکوێ دەچێت) ئێوە نایزانن.

(٢٠) ئەگەر فەزڵ و میهرەبانی خوایی نەبوایە لەسەرتان (بەو تۆمەت و بوختانەی کـە هەڵبەسـترا بـۆ دایکـی ئیمـانداران)، تووشی بەڵایەکی سەخت دەبوون، بەڵام دڵنیابن کە بەڕاستی خوا بەسۆز و میهرەبانە (زوو تۆڵە ناسێنێت).



﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَتَّبِعُواْ خُطُوَٰتِ ٱلشَّيۡطَٰنِۚ وَمَن يَتَّبِعۡ خُطُوَٰتِ ٱلشَّيۡطَٰنِ فَإِنَّهُۥ يَأۡمُرُ بِٱلۡفَحۡشَآءِ وَٱلۡمُنكَرِۚ وَلَوۡلَا فَضۡلُ ٱللَّهِ عَلَيۡكُمۡ وَرَحۡمَتُهُۥ مَا زَكَىٰ مِنكُم مِّنۡ أَحَدٍ أَبَدٗا وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ يُزَكِّي مَن يَشَآءُۗ وَٱللَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٞ ﴿٢١﴾ وَلَا يَأۡتَلِ أُوْلُواْ ٱلۡفَضۡلِ مِنكُمۡ وَٱلسَّعَةِ أَن يُؤۡتُوٓاْ أُوْلِي ٱلۡقُرۡبَىٰ وَٱلۡمَسَٰكِينَ وَٱلۡمُهَٰجِرِينَ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِۖ وَلۡيَعۡفُواْ وَلۡيَصۡفَحُوٓاْۗ أَلَا تُحِبُّونَ أَن يَغۡفِرَ ٱللَّهُ لَكُمۡۚ وَٱللَّهُ غَفُورٞ رَّحِيمٌ ﴿٢٢﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَرۡمُونَ ٱلۡمُحۡصَنَٰتِ ٱلۡغَٰفِلَٰتِ ٱلۡمُؤۡمِنَٰتِ لُعِنُواْ فِي ٱلدُّنۡيَا وَٱلۡأٓخِرَةِ وَلَهُمۡ عَذَابٌ عَظِيمٞ ﴿٢٣﴾ يَوۡمَ تَشۡهَدُ عَلَيۡهِمۡ أَلۡسِنَتُهُمۡ وَأَيۡدِيهِمۡ وَأَرۡجُلُهُم بِمَا كَانُواْ يَعۡمَلُونَ ﴿٢٤﴾ يَوۡمَئِذٖ يُوَفِّيهِمُ ٱللَّهُ دِينَهُمُ ٱلۡحَقَّ وَيَعۡلَمُونَ أَنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلۡحَقُّ ٱلۡمُبِينُ ﴿٢٥﴾ ٱلۡخَبِيثَٰتُ لِلۡخَبِيثِينَ وَٱلۡخَبِيثُونَ لِلۡخَبِيثَٰتِۖ وَٱلطَّيِّبَٰتُ لِلطَّيِّبِينَ وَٱلطَّيِّبُونَ لِلطَّيِّبَٰتِۚ أُوْلَٰٓئِكَ مُبَرَّءُونَ مِمَّا يَقُولُونَۖ لَهُم مَّغۡفِرَةٞ وَرِزۡقٞ كَرِيمٞ ﴿٢٦﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَدۡخُلُواْ بُيُوتًا غَيۡرَ بُيُوتِكُمۡ حَتَّىٰ تَسۡتَأۡنِسُواْ وَتُسَلِّمُواْ عَلَىٰٓ أَهۡلِهَاۚ ذَٰلِكُمۡ خَيۡرٞ لَّكُمۡ لَعَلَّكُمۡ تَذَكَّرُونَ ﴿٢٧﴾

(٢١) ئەی ئەوانەی ئیمان و باوەڕتان هێناوە شوێنی هەنگاو و نەخشە و پیلانەکانی شەیتان مەکەون، هەرکەس شوێنی هەنگاو و نەخشە و پیلانی شەیتان بکەوێت زەرەر دەکات، چونکە بەڕاستی شەیتان هەمیشە فەرمان بە کارو کردەوەی خراپ و گوناهو تاوان و ناشیرینی دەکات، ئەگەر فەزڵ و میهرەبانی خوا نەبوایە لەسەرتان ئەوە هەرگیز کەستان پاک و پوختەو رزگار نەدەبوون (لە دەست بوختانچیەکان، یاخود بە تەوبە پاک نەدەبوونەوە) بەڵام خوا هەرکەسێکی بوێت و شایستەبێت، پاکو پوختەی دەکات و لە گوناهەکانی دەبورێت، خوایش هەمیشە بیسەرو زانایە (بە تەوبە و پەشیمانیتان و بە نیەتی دڵ و دەروونتان).

(٢٢) ئەوانەی کەخاوەنی سامان و بەخشندەیین لە ئێوە باسوێند نەخۆن کە یارمەتی خزمان و هەژاران و کۆچبەران لە پێناوی خوادا نەدەن، (لەبەرئەوەی بەشداربوون لە وتنی بوختانەکەدا)، دەبا لێبووردەبن، دەبا چاوپۆشی بکەن، مەگەر حەز ناکەن خوا لێتان خۆش ببێت، خوایش هەمیشە لێخۆشبوو میهرەبانە.

(٢٣) بەڕاستی ئەوانەی ئافرەتانی ئیمانداری پاک داوێن و خاوەن مێرد و بێ ئاگا لە گوناه، تۆمەتبار دەکەن، ئەوانە نەفرینیان لێکراوە لە دنیا و قیامەتداو سزایەکی گەورە و سەخت ئامادەیە بۆیان (لە تۆڵەی لەکەدارکردنی پاکاندا)...

(٢٤) لە رۆژێکدا کە زمان و دەست و قاچیان لێیان دەبێتە شایەتێکی گۆیا، لەبەرامبەر ئەو کردەوانەوە کە ئەنجامیان دەدا و (ئەو بوختانانەی کە دەیانکرد).

(٢٥) ئەو رۆژە خوا بەگوێرەی کارو کردەوە و ئیمان و باوەڕی حەقیقیان پاداشتیان دەداتەوە، ئەوسا چاک بۆیان دەردەکەوێت کە بەڕاستی خوا خۆی زاتێکی ڕاست و دروستی ئاشکرایە (هیچی لێ وون نابێت).

(٢٦) ژنانی ناپاک بۆ پیاوانی ناپاک و پیاوانی ناپوخت بۆ ژنانی ناپوخت، ئافرەتانی پاکیش بۆ پیاوانی پاک، پیاوانی پاکیش بۆ ئافرەتانی پاک، ئەو پاکانە بەرین لەو تۆمەتانەی کە ناپاکان هەڵی دەبەستن (چونکە محمدی پاک هاوسەری عائیشەی پاکە ﷺ)، بۆ ئەو چاکانە لێخۆشبوون و رزق و رۆزی بەنرخ ئامادەیە.

(٢٧) ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە مەچنە هیچ ماڵێکی تر جگە لە ماڵەکانی خۆتان هەتا کارێک نەکەن کە ئەوان ئاگادار بن (وەکو زەنگ لێدان یان لە دەرگادان) پاشان کە مۆڵەتدران سەلام بکەن لە خەڵکی ماڵەکە، ئەوە چاکترە بۆتان و بەو شێوەیە رەفتار بکەن، هەوڵ بدەن لە یادتان بێت و ئەو شێوازە فەرامۆش نەکەن (کاتی لەبارو گونجاو هەڵبژێرن بۆ سەردانەکانتان، بۆ ئەوەی میوان و خاوەن ماڵ دڵیان بەیەک بکرێتەوە).

فَإِن لَّمْ تَجِدُوا فِيهَا أَحَدًا فَلَا تَدْخُلُوهَا حَتَّىٰ يُؤْذَنَ لَكُمْ وَإِن قِيلَ لَكُمُ ارْجِعُوا فَارْجِعُوا هُوَ أَزْكَىٰ لَكُمْ وَاللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ عَلِيمٌ ﴿٢٨﴾ لَّيْسَ عَلَيْكُمْ جُنَاحٌ أَن تَدْخُلُوا بُيُوتًا غَيْرَ مَسْكُونَةٍ فِيهَا مَتَاعٌ لَّكُمْ وَاللَّهُ يَعْلَمُ مَا تُبْدُونَ وَمَا تَكْتُمُونَ ﴿٢٩﴾ قُل لِّلْمُؤْمِنِينَ يَغُضُّوا مِنْ أَبْصَارِهِمْ وَيَحْفَظُوا فُرُوجَهُمْ ذَٰلِكَ أَزْكَىٰ لَهُمْ إِنَّ اللَّهَ خَبِيرٌ بِمَا يَصْنَعُونَ ﴿٣٠﴾ وَقُل لِّلْمُؤْمِنَاتِ يَغْضُضْنَ مِنْ أَبْصَارِهِنَّ وَيَحْفَظْنَ فُرُوجَهُنَّ وَلَا يُبْدِينَ زِينَتَهُنَّ إِلَّا مَا ظَهَرَ مِنْهَا وَلْيَضْرِبْنَ بِخُمُرِهِنَّ عَلَىٰ جُيُوبِهِنَّ وَلَا يُبْدِينَ زِينَتَهُنَّ إِلَّا لِبُعُولَتِهِنَّ أَوْ آبَائِهِنَّ أَوْ آبَاءِ بُعُولَتِهِنَّ أَوْ أَبْنَائِهِنَّ أَوْ أَبْنَاءِ بُعُولَتِهِنَّ أَوْ إِخْوَانِهِنَّ أَوْ بَنِي إِخْوَانِهِنَّ أَوْ بَنِي أَخَوَاتِهِنَّ أَوْ نِسَائِهِنَّ أَوْ مَا مَلَكَتْ أَيْمَانُهُنَّ أَوِ التَّابِعِينَ غَيْرِ أُولِي الْإِرْبَةِ مِنَ الرِّجَالِ أَوِ الطِّفْلِ الَّذِينَ لَمْ يَظْهَرُوا عَلَىٰ عَوْرَاتِ النِّسَاءِ وَلَا يَضْرِبْنَ بِأَرْجُلِهِنَّ لِيُعْلَمَ مَا يُخْفِينَ مِن زِينَتِهِنَّ وَتُوبُوا إِلَى اللَّهِ جَمِيعًا أَيُّهَ الْمُؤْمِنُونَ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ ﴿٣١﴾

(٢٨) جا ئەگەر کەستان نەبینی تیایدا، یاخود هەستتان کرد کەس لە ماڵ نیە، مەچنە ژوورەوە هەتا مۆڵەت نەدرێن، ئەگەر پێتان وترا بگەڕێنەوە (کاتمان نیە، یان کارمان هەیە...) بگەڕێنەوە (بەبێ دڵگرانی) ئەوە چاکترە بۆتان، چاکیش بزانن خوا زانایە بە هەموو ئەو کارو کردەوانەی کە ئەنجامی دەدەن.

(٢٩) گوناهبار نابن ئەگەر بچنە ماڵێکەوە کەسی تێدا نیشتەجێ نەبێت و کەلو پەلی خۆتانی تێدا بێت، خواش دەزانێت و ئاگادارە بەوەی دەری دەخەن و بەوەش کە دەیشارنەوە.

(٣٠) (ئەی پێغەمبەرﷺ) بەپیاوانی ئیماندار بڵێ: چاویان بپارێزن (لە سەرنجدانی ئافرەتانی نامەحرەم) هەروەها نامووس و عەورەتی خۆیان لە حەرام بپارێزن، بێگومان ئەوە پاکترو پوختترە بۆیان (بۆ دڵ و دەروون و رواڵەت و رۆح و لاشەیان) بەڕاستی خوا ئاگادارە بەو هەڵس و کەوت و رەفتارانەی کە دەیکەن.

(٣١) بەئافرەتانی ئیمانداریش بڵێ: چاویان بپارێزن (لە تەماشای نامەحرەم) داوێنی خۆیان بپارێزن لە گوناهـ و جوانی خۆیان دەرنەخەن جگە لەوەی کە دیارە (وەکو دەم و چاو و دەست) با سەرپۆشەکانیان بدەن بەسەر سینەو ملیانداو جوانی و زینەتی خۆیان دەرنەخەن بە تەواوی بۆ هاوسەرەکانیان نەبێت، یان باوکی خۆیان، یان باوکی مێردەکانیان، یان کوڕی خۆیان، یان کوڕی مێردەکانیان، یان بۆ براکانی خۆیان، یان برازاکانیان، یان خوشکەزاکانیان، یان ئافرەتێک کە پەیوەندییان هەیە پێکەوە، یان ئەوانەش کە کەنیزەکیانن (کە لە بارودۆخی تایبەتدا هەبوون) یان ئەوانەی کە لە ماڵەکانتاندا دەژین و پێویستیان بە ئافرەت نیە (لەبەر پیری، یان نەخۆشی...هتد) یاخود ئەو منداڵانەی کە هێشتا شارەزاییان لە ئافرەتان نیە و (ئارەزووی جنسیان بۆ دروست نەبووەو نازانن باسی عەورات بکەن) نابێت ئافرەتانی ئیماندار قاچیان دەربخەن و پێیان بدەن بە زەویدا (تا دەنگی خشڵ و پاوانەکانیان بێت) و بزانرێت کە زینەتدارو خشڵدارن، کەواتە هەمووتان ئەی ئیمانداران بەرەو لای خوا و بەدەستهێنانی رەزامەندی ئەو بگەڕێنەوە بۆ ئەوەی رزگار و سەرفراز بن.

وَأَنكِحُوا۟ ٱلْأَيَٰمَىٰ مِنكُمْ وَٱلصَّٰلِحِينَ مِنْ عِبَادِكُمْ وَإِمَآئِكُمْ ۚ إِن يَكُونُوا۟ فُقَرَآءَ يُغْنِهِمُ ٱللَّهُ مِن فَضْلِهِۦ ۗ وَٱللَّهُ وَٰسِعٌ عَلِيمٌ ﴿٣٢﴾ وَلْيَسْتَعْفِفِ ٱلَّذِينَ لَا يَجِدُونَ نِكَاحًا حَتَّىٰ يُغْنِيَهُمُ ٱللَّهُ مِن فَضْلِهِۦ ۗ وَٱلَّذِينَ يَبْتَغُونَ ٱلْكِتَٰبَ مِمَّا مَلَكَتْ أَيْمَٰنُكُمْ فَكَاتِبُوهُمْ إِنْ عَلِمْتُمْ فِيهِمْ خَيْرًا ۖ وَءَاتُوهُم مِّن مَّالِ ٱللَّهِ ٱلَّذِىٓ ءَاتَىٰكُمْ ۚ وَلَا تُكْرِهُوا۟ فَتَيَٰتِكُمْ عَلَى ٱلْبِغَآءِ إِنْ أَرَدْنَ تَحَصُّنًا لِّتَبْتَغُوا۟ عَرَضَ ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا ۚ وَمَن يُكْرِههُّنَّ فَإِنَّ ٱللَّهَ مِنۢ بَعْدِ إِكْرَٰهِهِنَّ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿٣٣﴾ وَلَقَدْ أَنزَلْنَآ إِلَيْكُمْ ءَايَٰتٍ مُّبَيِّنَٰتٍ وَمَثَلًا مِّنَ ٱلَّذِينَ خَلَوْا۟ مِن قَبْلِكُمْ وَمَوْعِظَةً لِّلْمُتَّقِينَ ﴿٣٤﴾ ۞ ٱللَّهُ نُورُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۚ مَثَلُ نُورِهِۦ كَمِشْكَوٰةٍ فِيهَا مِصْبَاحٌ ۖ ٱلْمِصْبَاحُ فِى زُجَاجَةٍ ۖ ٱلزُّجَاجَةُ كَأَنَّهَا كَوْكَبٌ دُرِّىٌّ يُوقَدُ مِن شَجَرَةٍ مُّبَٰرَكَةٍ زَيْتُونَةٍ لَّا شَرْقِيَّةٍ وَلَا غَرْبِيَّةٍ يَكَادُ زَيْتُهَا يُضِىٓءُ وَلَوْ لَمْ تَمْسَسْهُ نَارٌ ۚ نُّورٌ عَلَىٰ نُورٍ ۗ يَهْدِى ٱللَّهُ لِنُورِهِۦ مَن يَشَآءُ ۚ وَيَضْرِبُ ٱللَّهُ ٱلْأَمْثَٰلَ لِلنَّاسِ ۗ وَٱللَّهُ بِكُلِّ شَىْءٍ عَلِيمٌ ﴿٣٥﴾ فِى بُيُوتٍ أَذِنَ ٱللَّهُ أَن تُرْفَعَ وَيُذْكَرَ فِيهَا ٱسْمُهُۥ يُسَبِّحُ لَهُۥ فِيهَا بِٱلْغُدُوِّ وَٱلْـَٔاصَالِ ﴿٣٦﴾



(٣٢) ژن بدەن بەپیاوانی بێ ژن و ئافرەتانی بێوەژن بدەن بەشوو، هەروەها ژن بدەن بەبەندە صالحەکانتان و کەنیزەکەکانیشتان بدەن بە شوو ئەگەر هەژاریش بن، ئەوە خوا لە فەزڵ و بەخششی خۆی بەهرەوەریان دەکات، خوای گەورەش هەمیشە فراوانگیرو زانایە.

(٣٣) دەبا ئەوانەی هاوسەریان دەست ناکەوێت هەوڵ بدەن داوێنی خۆیان پاک رابگرن، هەتا خوا لە فەزڵی خۆی دەوڵەمەند و بێ نیازیان دەکات، ئەو کەسانەش کە دەیانەوێت خۆیان رزگار بکەن لە بەندەکانتان و خۆیان بکڕنەوە، ئەوە ئێوە لەگەڵیاندا رێک بکەون و رێگەی ئازادییان بۆ ئاسان بکەن، ئەگەر خێرتان تێدا بەدی دەکردن و لەو ماڵ و سامانەی کە خوا پێی بەخشیوون بەشیان بدەن و بەزۆر کەنیزەکەکانتان هانمەدەن بۆ داوێن پیسی، ئەگەر ئەوان پاک داوێنیان دەویست (دەبێت پیاوی ئازاد زیاتر پاکداوێنی مەبەست بێت)، بۆ ئەوەی لەو رێگە چەوتەوە ماڵ و سامانی ژیانی دنیا بەدەست بهێنن، جا ئەوەی بەزۆر ئەو گوناهەیان پێ بکات، ئەوە بەراستی خوا دوای ئەو زۆر بۆ هێنانەیان لێخۆش بوو میهرەبانە و چاوپۆشیان لێ دەکات.

(٣٤) سوێند بە خوا بێگومان ئێمە چەندەها ئایەت و فەرمانی ئاشکراو روونمان بۆدابەزاندوون و هەروەها چەندەها نموونە و سەرگوزەشتەی ئەوانەی پێش خۆتان کە تێپەریان کردووە، هاورێ لەگەڵ پەند و ئامۆژگاری بۆ خواناس و پارێزکاران.

(٣٥) خوا نوورو رووناکی ئاسمانەکان و زەویە (نوورو رووناکی بەخشە پێیان)، نموونەی نوور و رووناکیەکەی وەک تاقێک وایە چرایەکی تێدا بێت، چراکەش لەناو شووشەیەکدا بێت، شووشەکەش وەک هەسارەیەکی گەش و پرشنگدار وابێت و داگیرسا بێت بە رۆنی درەختی موبارەک و بەفەڕی زەیتوون، رووی نە لە رۆژهەڵات و نە لە رۆژئاوا بێت (لە شوێنێکدا بێت بەیانی و ئێوارە خۆر لێ بدات)، رۆنەکەشی (ئەوەندە پاک و بێگەردە) خەریکە خۆی دابگیرسێت و رووناکی بداتەوە، ئەگەر ئاگریش لێی نەدات، ئەو هیدایەت و رێنموویی‌یە کە قورئانە رووناکی‌یە لەسەر رووناکی، خوایش هیدایەتی ئەو کەسانە دەدات کە دەیەوێت و شایستەن بۆ لای نووری خۆی کە قورئانە، خوا چەندەها نموونە دەهێنێتەوە بۆ خەڵکی (تا لە نموونە مەعنەوویی‌یەکان تێبگەن) خوایش بەهەموو شتێک زانایە...

(٣٦) ئەو نوورەش دەستدەکەوێت لە چەند ماڵێکدا (کە مزگەوتەکانن) خوا فەرمانیداوە کە دروست بکرێن و بەرز بکرێنەوە و ناوی پیرۆزی ئەوی تیادا ببرێت (نوێژو قورئان و وانەی ئاینی تیادا ئەنجام بدرێت) و ستایش و تەسبیحاتی تیادا بکرێت لە بەیانیان و دەمە و ئێوارانداا.

رِجَالٌ لَّا تُلْهِيهِمْ تِجَارَةٌ وَلَا بَيْعٌ عَن ذِكْرِ ٱللَّهِ وَإِقَامِ ٱلصَّلَوٰةِ وَإِيتَآءِ ٱلزَّكَوٰةِ يَخَافُونَ يَوْمًا تَتَقَلَّبُ فِيهِ ٱلْقُلُوبُ وَٱلْأَبْصَٰرُ ﴿٣٧﴾ لِيَجْزِيَهُمُ ٱللَّهُ أَحْسَنَ مَا عَمِلُوا۟ وَيَزِيدَهُم مِّن فَضْلِهِۦ ۗ وَٱللَّهُ يَرْزُقُ مَن يَشَآءُ بِغَيْرِ حِسَابٍ ﴿٣٨﴾ وَٱلَّذِينَ كَفَرُوٓا۟ أَعْمَٰلُهُمْ كَسَرَابٍۭ بِقِيعَةٍ يَحْسَبُهُ ٱلظَّمْـَٔانُ مَآءً حَتَّىٰٓ إِذَا جَآءَهُۥ لَمْ يَجِدْهُ شَيْـًٔا وَوَجَدَ ٱللَّهَ عِندَهُۥ فَوَفَّىٰهُ حِسَابَهُۥ ۗ وَٱللَّهُ سَرِيعُ ٱلْحِسَابِ ﴿٣٩﴾ أَوْ كَظُلُمَٰتٍ فِى بَحْرٍ لُّجِّىٍّ يَغْشَىٰهُ مَوْجٌ مِّن فَوْقِهِۦ مَوْجٌ مِّن فَوْقِهِۦ سَحَابٌ ۚ ظُلُمَٰتٌۢ بَعْضُهَا فَوْقَ بَعْضٍ إِذَآ أَخْرَجَ يَدَهُۥ لَمْ يَكَدْ يَرَىٰهَا ۗ وَمَن لَّمْ يَجْعَلِ ٱللَّهُ لَهُۥ نُورًا فَمَا لَهُۥ مِن نُّورٍ ﴿٤٠﴾ أَلَمْ تَرَ أَنَّ ٱللَّهَ يُسَبِّحُ لَهُۥ مَن فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَٱلطَّيْرُ صَٰٓفَّٰتٍ ۖ كُلٌّ قَدْ عَلِمَ صَلَاتَهُۥ وَتَسْبِيحَهُۥ ۗ وَٱللَّهُ عَلِيمٌۢ بِمَا يَفْعَلُونَ ﴿٤١﴾ وَلِلَّهِ مُلْكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۖ وَإِلَى ٱللَّهِ ٱلْمَصِيرُ ﴿٤٢﴾ أَلَمْ تَرَ أَنَّ ٱللَّهَ يُزْجِى سَحَابًا ثُمَّ يُؤَلِّفُ بَيْنَهُۥ ثُمَّ يَجْعَلُهُۥ رُكَامًا فَتَرَى ٱلْوَدْقَ يَخْرُجُ مِنْ خِلَٰلِهِۦ وَيُنَزِّلُ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مِن جِبَالٍ فِيهَا مِنۢ بَرَدٍ فَيُصِيبُ بِهِۦ مَن يَشَآءُ وَيَصْرِفُهُۥ عَن مَّن يَشَآءُ ۖ يَكَادُ سَنَا بَرْقِهِۦ يَذْهَبُ بِٱلْأَبْصَٰرِ ﴿٤٣﴾

(٣٧) پیاوانێک ستایشی خوا دەکەن لەو مزگەوتانەدا کە بازرگانی و کڕین و فرۆشتن سەرگەرمیان ناکات و غافڵ نابن لە یادی خواو ئەنجامدانی نوێژەکان و بەخشینی زەکات و لە ڕۆژێک دەترسن کە دڵان و چاوان تیایدا ناوەژوو دەبن (لە ترس و هەیبەتی ئەو ڕۆژە).

(٣٨) بەئومێدی ئەوەن خوا بەچاکترین شێوە پاداشتیان بداتەوە و لە فەزڵ و بەخششی خۆی بەهرەوەریان بکات، بەڕاستی خوا ڕزق و ڕۆزی بێسنوور دەبەخشێت بەهەر کەس کە بیەوێت و شایستە بێت.

(٣٩) ئەوانەی کە ڕێبازی کوفریان گرتۆتەبەر کردەوەکانیان وەک تراویلکە و سەرابێک وایە لە بیابانێکدا بریسکە بداتەوە کەسێکی تینوو وا بزانێت ئاوە (بەتاڵوکە بۆی بچێت)، هەتا کاتێک گەیشتە لای دەبینێت هیچ نیە، ئەوسا (کاتێک بەخۆی دەزانێت ژیانی کۆتایەو قیامەت بەرپا بووە) خوایش ئامادەیە لەلایدا بەگوێرەی کردەوەی موحاسەبەی دەکات و لێی دەپرسێتەوە ، خوایش بەخێرایی لێ پرسینەوە ئەنجام دەدات.

(٤٠) یاخود (کردەوەیان) وەک چەندەها تاریکایی وایە کە لەناو دەریایەکی قوڵدا شەپۆل لەسەر شەپۆل بدات بەسەریدا، لە سەروشیەوە هەورێکی تاریک دایگرتبێت، تاریکاییەکان چین چین لەسەریەک نیشتبن، کاتێک کە دەستی دەربهێنێت خەریکە دەستی خۆی نەبینێت (لەبەر تاریکی) بێگومان ئەوەی خوا نووری پێ نەبەخشێت، هەرگیز نووری دەست ناکەوێت.

(٤١) ئایا نەتبینیوە کە بەڕاستی هەرچی و هەرکەس لە ئاسمانەکان و زەویدا هەیە، تەسبیحات و ستایشی خوا دەکەن، هەروەها باڵندەکانیش لەکاتێکدا پۆل پۆل (بەئاسماندا دەفڕن) هەر هەموویان ستایش و پەرستش و تەسبیحاتی خۆیان زانیووە، خوایش هەمیشە زانایە بەوەی کە دەیکەن.

(٤٢) هەموو ئاسمانەکان و زەوی هەر خوا خاوەنیانە، سەرئەنجام گەڕانەوەی هەمووان هەر بۆ لای خوایە.

(٤٣) ئایا نابینیت کە بێگومان خوا بەئارامی و شێنەیی هەورەکان بەئاسماندا دەبات دوایی پەیوەستیان دەکات بەیەکەوە، ئەوسا کەڵەکەیان دەکات لەسەر یەک، ئینجا دەبینیت لەتوێی ئەو هەورانەوە کە وەکو کێو وان باران و تەرزە دەبارێنێت (کاتێک کە بەفڕۆکە سەروو هەورەکان دەکەوین بەچاکی بۆمان دەردەکەوێت، کە هەورەکان وەک چیا چوون بە ئاسمانداو دۆڵ و شیو لەنێوانیاندا هەیە)، جا لەسوودی ئەو بارانە بە هەرکەس خوا بیەوێت، خێرو بەرەکەت دەبەخشێت، هەرکەسیش کە بیەوێت لێی دوور دەخاتەوە، (هەورە بروسکەکان ئەوەندە بەهێزن) خەریکە بریسکەکەیان بینایی چاوان بەرێت.

يُقَلِّبُ ٱللَّهُ ٱلَّيْلَ وَٱلنَّهَارَ ۚ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَعِبْرَةً لِّأُو۟لِى ٱلْأَبْصَٰرِ ﴿٤٤﴾ وَٱللَّهُ خَلَقَ كُلَّ دَآبَّةٍ مِّن مَّآءٍ ۖ فَمِنْهُم مَّن يَمْشِى عَلَىٰ بَطْنِهِۦ وَمِنْهُم مَّن يَمْشِى عَلَىٰ رِجْلَيْنِ وَمِنْهُم مَّن يَمْشِى عَلَىٰٓ أَرْبَعٍ ۚ يَخْلُقُ ٱللَّهُ مَا يَشَآءُ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ ﴿٤٥﴾ لَّقَدْ أَنزَلْنَآ ءَايَٰتٍ مُّبَيِّنَٰتٍ ۚ وَٱللَّهُ يَهْدِى مَن يَشَآءُ إِلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ ﴿٤٦﴾ وَيَقُولُونَ ءَامَنَّا بِٱللَّهِ وَبِٱلرَّسُولِ وَأَطَعْنَا ثُمَّ يَتَوَلَّىٰ فَرِيقٌ مِّنْهُم مِّنۢ بَعْدِ ذَٰلِكَ ۚ وَمَآ أُو۟لَٰٓئِكَ بِٱلْمُؤْمِنِينَ ﴿٤٧﴾ وَإِذَا دُعُوٓا۟ إِلَى ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ لِيَحْكُمَ بَيْنَهُمْ إِذَا فَرِيقٌ مِّنْهُم مُّعْرِضُونَ ﴿٤٨﴾ وَإِن يَكُن لَّهُمُ ٱلْحَقُّ يَأْتُوٓا۟ إِلَيْهِ مُذْعِنِينَ ﴿٤٩﴾ أَفِى قُلُوبِهِم مَّرَضٌ أَمِ ٱرْتَابُوٓا۟ أَمْ يَخَافُونَ أَن يَحِيفَ ٱللَّهُ عَلَيْهِمْ وَرَسُولُهُۥ ۚ بَلْ أُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلظَّٰلِمُونَ ﴿٥٠﴾ إِنَّمَا كَانَ قَوْلَ ٱلْمُؤْمِنِينَ إِذَا دُعُوٓا۟ إِلَى ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ لِيَحْكُمَ بَيْنَهُمْ أَن يَقُولُوا۟ سَمِعْنَا وَأَطَعْنَا ۚ وَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُفْلِحُونَ ﴿٥١﴾ وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ وَيَخْشَ ٱللَّهَ وَيَتَّقْهِ فَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْفَآئِزُونَ ﴿٥٢﴾ ۞ وَأَقْسَمُوا۟ بِٱللَّهِ جَهْدَ أَيْمَٰنِهِمْ لَئِنْ أَمَرْتَهُمْ لَيَخْرُجُنَّ ۖ قُل لَّا تُقْسِمُوا۟ ۖ طَاعَةٌ مَّعْرُوفَةٌ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ خَبِيرٌۢ بِمَا تَعْمَلُونَ ﴿٥٣﴾



(٤٤) خوای گەورە ئاڵوگۆڕ بەشەو و ڕۆژ دەکات، بەڕاستی ئا لەو شتانەدا پەند و ئامۆژگاری هەیە بۆ خاوەن دیدو ڕۆشنبیرەکان.

(٤٥) هەروەها خوا هەموو زیندەوەرێکی لە ئاوێکی تایبەت دروست کردووە، جا هەیانە لەسەر سکی دەڕوات، هەیشە لەسەر دوو قاچ دەڕوات، هەیشە لەسەر چوار پێ دەڕوات، خوا هەرچی بوێت دروستی دەکات، بەڕاستی خوا دەسەڵاتی بەسەر هەموو شتێکدا هەیە.

(٤٦) سوێند بە خوا بێگومان ئێمە چەندەها بەڵگەی روون و ئاشکرامان دابەزاندووە و خوا هیدایەتی هەر کەسێک کە ویستی لەسەر بێت و خۆیشی بیەوێت دەدات بۆ ڕێگەو ڕێبازی راست و دروست.

(٤٧) (دووڕووەکان) تەنها بەزمان دەڵێن: ئێمەش باوەڕمان هێناوە بە خواو بە پێغەمبەرو فەرمانبەرداریشین، کەچی لەوەودوا دەستەیەکیان روو وەردەگێڕن و درۆ دەکەن، ئا ئەوانە ئیماندار نین.

(٤٨) ئەوانە کاتێک بانگ دەکرێن بۆ لای بەرنامەی خوا و پێغەمبەرەکەی تا فەرمانڕەوا بێت لەنێوانیاندا، خێرا دەستەیەکیان پشت هەڵدەکەن و نارەزایی دەردەبڕن.

(٤٩) خۆ ئەگەر شەرع حەقەکە بەوان بدات ئەوە بەملکەچی و فەرمانبەردارییەوە دێن بۆ لای.

(٥٠) ئایا ئەوانە لە دڵەکانیاندا نەخۆشی کوفرو خوانەناسی هەیە؟ یاخود گومانیان هەیە؟ (لە دادپەروەریی پێغەمبەر و قورئان)، یاخود دەترسن لەوەی کە خوا و پێغەمبەری ستەمیان لێ بکات؟! نەخێر وانییە، ئا ئەوانە هەر خۆیان ستەمکارن (چاویان بەحەقدا هەڵنایەت).

(٥١) بەڵام گوفتاری ئیمانداران کاتێک بانگ دەکرێن بۆ لای خواو پێغەمبەرەکەی تا فەرمانڕەوایی بکات لە نێوانیاندا تەنها ئەوەیە کە دەڵێن: بیستمان و گوێڕایەڵین بۆ هەموو فەرمانێکی شەرع، هەر ئائەوانەشن سەرفراز و سەرکەوتوو.

(٥٢) جا ئەوەی فەرمانبەرداری خوا و پێغەمبەرەکەی بکات و لە خوا بترسێت و لە سەرپێچی و نافەرمانی خۆی بپارێزێت، جا ئا ئەوانە سەرفرازو بەئاوات گەیشتوون.

(٥٣) دووڕووەکان سوێندی گەورە بەخوا دەخۆن، ئەگەر فەرمانیان پێ بدەیت کە دەرچن بۆ خەبات و جیهاد، دەردەچن و ئامادەن، پێیان بڵێ: سوێند مەخۆن ملکەچی ئێوە زانراو و دیارە؟! (هەموو کات کردارو گوفتارتان جیایە)، بەڕاستی خوا ئاگایە بەو کارو کردەوانەی کە ئەنجامی دەدەن.

قُلۡ أَطِيعُواْ ٱللَّهَ وَأَطِيعُواْ ٱلرَّسُولَۖ فَإِن تَوَلَّوۡاْ فَإِنَّمَا عَلَيۡهِ مَا حُمِّلَ
وَعَلَيۡكُم مَّا حُمِّلۡتُمۡۖ وَإِن تُطِيعُوهُ تَهۡتَدُواْۚ وَمَا عَلَى ٱلرَّسُولِ
إِلَّا ٱلۡبَلَٰغُ ٱلۡمُبِينُ ﴿٥٤﴾ وَعَدَ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مِنكُمۡ وَعَمِلُواْ
ٱلصَّٰلِحَٰتِ لَيَسۡتَخۡلِفَنَّهُمۡ فِي ٱلۡأَرۡضِ كَمَا ٱسۡتَخۡلَفَ
ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِهِمۡ وَلَيُمَكِّنَنَّ لَهُمۡ دِينَهُمُ ٱلَّذِي ٱرۡتَضَىٰ لَهُمۡ
وَلَيُبَدِّلَنَّهُم مِّنۢ بَعۡدِ خَوۡفِهِمۡ أَمۡنٗاۚ يَعۡبُدُونَنِي لَا يُشۡرِكُونَ بِي
شَيۡـٔٗاۚ وَمَن كَفَرَ بَعۡدَ ذَٰلِكَ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡفَٰسِقُونَ ﴿٥٥﴾
وَأَقِيمُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتُواْ ٱلزَّكَوٰةَ وَأَطِيعُواْ ٱلرَّسُولَ لَعَلَّكُمۡ
تُرۡحَمُونَ ﴿٥٦﴾ لَا تَحۡسَبَنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ مُعۡجِزِينَ فِي ٱلۡأَرۡضِۚ
وَمَأۡوَىٰهُمُ ٱلنَّارُۖ وَلَبِئۡسَ ٱلۡمَصِيرُ ﴿٥٧﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ
لِيَسۡتَـٔۡذِنكُمُ ٱلَّذِينَ مَلَكَتۡ أَيۡمَٰنُكُمۡ وَٱلَّذِينَ لَمۡ يَبۡلُغُواْ ٱلۡحُلُمَ مِنكُمۡ
ثَلَٰثَ مَرَّٰتٖۚ مِّن قَبۡلِ صَلَوٰةِ ٱلۡفَجۡرِ وَحِينَ تَضَعُونَ ثِيَابَكُم مِّنَ ٱلظَّهِيرَةِ
وَمِنۢ بَعۡدِ صَلَوٰةِ ٱلۡعِشَآءِۚ ثَلَٰثُ عَوۡرَٰتٖ لَّكُمۡۚ لَيۡسَ عَلَيۡكُمۡ
وَلَا عَلَيۡهِمۡ جُنَاحُۢ بَعۡدَهُنَّۚ طَوَّٰفُونَ عَلَيۡكُم بَعۡضُكُمۡ عَلَىٰ
بَعۡضٖۚ كَذَٰلِكَ يُبَيِّنُ ٱللَّهُ لَكُمُ ٱلۡأٓيَٰتِۗ وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٞ ﴿٥٨﴾

(٥٤) پێیان بڵێ: فەرمانبەرداری خواو فەرمانبەرداری پێغەمبەر بن، خۆ ئەگەر پشتیان هەڵکرد، ئەوە ئەو تەنها گەیاندنی پەیامی خوای لەسەر شانە، ئێوەش سەرپێچی و یاخی بوونەکەتان لەسەرتان دەکەوێت، خۆ ئەگەر فەرمانبەرداری بن و گوێڕایەڵ و ملکەچ بن بەڕاستی ئەوە هیدایەت وەردەگرن، دڵنیاش بن کە ئەرکی سەرشانی پێغەمبەر ﷺ تەنها گەیاندنێکی روون و ئاشکرایە و هیچی تر نییە.

(٥٥) خوا بەڵێنی دڵنیابەخش و تەواوی داوە بەوانەی باوەڕیان هێناوە لە ئێوە و کارو کردەوە چاکەکانیان ئەنجامداوە بەڕاستی لەئایندەیەکی نزیکدا جێنشین و پایەداریان دەکات لە وڵاتدا هەروەک چۆن ئیماندارانی پێش ئەمانی جێنشین کردووە و ئەو دین و ئاینەیان بۆ دەچەسپێنێت خوا خۆی پێی رازیە، هەروەها ترس وبیمیان بۆ دەگۆڕێت بەئارامی و هێمنی، ئەو کاتە ئیتر بەتەواوی هەر من دەپەرستن و هەرگیز هیچ جۆرە هاوەڵ و شەریکێکم بۆ بڕیار نادەن، ئەوسا ئەوەی دوای ئەو پایەداریە بێباوەڕ بێت، ئا ئەو جۆرە کەسانە هەر تاوانبارو لە سنوور دەرچوون.

(٥٦) ئەی ئیمانداران؛ نوێژەکانتان لەکاتی خۆیدا بەچاکی ئەنجام بدەن و زەکاتی ماڵەکانتان بدەن و فەرمانبەرداری پێغەمبەریش بکەن بەڵکو رەحمتان پێ بکرێت.

(٥٧) وامەزانە ئەوانەی کە بێ باوەڕ و خوانەناس بوون لە دەست سزاو تۆڵەی خوا لەسەر زەوی رزگاریان دەبێت، ئەوانە لە قیامەتدا شوێنیان ئاگری دۆزەخە، ئای چ سەرەنجامێکی خراپە.

(٥٨) ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە با بەندە و ئەو منداڵانەتان (کە هێشتا نەگەیشتونەتە تەمەنی هەرزەکاری) لە سێ کاتدا (فێری ئەوە بکرێن) مۆڵەت بخوازن (لە سەردانی ژووری نووستنی ژن و مێردا) پێش نوێژی بەیانی، کاتی نیوەڕۆ کە پۆشاکتان دادەنێن (بۆ حەوانەوە)، لە دوای نوێژی خەوتنان، سێ کاتە کە لەوانەیە عەورەتی ئێوەی تێدا دەربکەوێت (با کەسی تر؛ نەتانبینێت)، لە دوای ئەو سێ کاتە قەیناکات بۆ ئێوەش و ئەوانیش، کە بگەڕێن بەناویەکدا و بچن بۆ لای یەکتر، ئا بەو شێوەیە خوا ئایەتەکانی خۆیتان بۆ روون دەکاتەوە، (تا تووشی کێشەی دەروونی نەبن) خواش هەمیشە زانا و دانایە (بەوەی کە دەبێتە مایەی خێرو خۆشیتان).

وَإِذَا بَلَغَ ٱلۡأَطۡفَٰلُ مِنكُمُ ٱلۡحُلُمَ فَلۡيَسۡتَـٔۡذِنُواْ كَمَا ٱسۡتَـٔۡذَنَ ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِهِمۡۚ كَذَٰلِكَ يُبَيِّنُ ٱللَّهُ لَكُمۡ ءَايَٰتِهِۦۗ وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ ﴿٥٩﴾ وَٱلۡقَوَٰعِدُ مِنَ ٱلنِّسَآءِ ٱلَّٰتِي لَا يَرۡجُونَ نِكَاحٗا فَلَيۡسَ عَلَيۡهِنَّ جُنَاحٌ أَن يَضَعۡنَ ثِيَابَهُنَّ غَيۡرَ مُتَبَرِّجَٰتِۢ بِزِينَةٖۖ وَأَن يَسۡتَعۡفِفۡنَ خَيۡرٞ لَّهُنَّۗ وَٱللَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٞ ﴿٦٠﴾ لَّيۡسَ عَلَى ٱلۡأَعۡمَىٰ حَرَجٞ وَلَا عَلَى ٱلۡأَعۡرَجِ حَرَجٞ وَلَا عَلَى ٱلۡمَرِيضِ حَرَجٞ وَلَا عَلَىٰٓ أَنفُسِكُمۡ أَن تَأۡكُلُواْ مِنۢ بُيُوتِكُمۡ أَوۡ بُيُوتِ ءَابَآئِكُمۡ أَوۡ بُيُوتِ أُمَّهَٰتِكُمۡ أَوۡ بُيُوتِ إِخۡوَٰنِكُمۡ أَوۡ بُيُوتِ أَخَوَٰتِكُمۡ أَوۡ بُيُوتِ أَعۡمَٰمِكُمۡ أَوۡ بُيُوتِ عَمَّٰتِكُمۡ أَوۡ بُيُوتِ أَخۡوَٰلِكُمۡ أَوۡ بُيُوتِ خَٰلَٰتِكُمۡ أَوۡ مَا مَلَكۡتُم مَّفَاتِحَهُۥٓ أَوۡ صَدِيقِكُمۡۚ لَيۡسَ عَلَيۡكُمۡ جُنَاحٌ أَن تَأۡكُلُواْ جَمِيعًا أَوۡ أَشۡتَاتٗاۚ فَإِذَا دَخَلۡتُم بُيُوتٗا فَسَلِّمُواْ عَلَىٰٓ أَنفُسِكُمۡ تَحِيَّةٗ مِّنۡ عِندِ ٱللَّهِ مُبَٰرَكَةٗ طَيِّبَةٗۚ كَذَٰلِكَ يُبَيِّنُ ٱللَّهُ لَكُمُ ٱلۡأٓيَٰتِ لَعَلَّكُمۡ تَعۡقِلُونَ ﴿٦١﴾

(٥٩) هەرکاتێک منداڵەکانتان باڵغ بوون، با ئەوانیش مۆڵەت بخوازن، وەکو چۆن کەسانی پێش ئەمان مۆڵەتیان خواستووە (لەکاتی هاتووچۆ کردنی ژووری دایک و باوکدا)، ئا بەو شێوەیە خوا ئایەتەکانی خۆیتان بۆ روون دەکاتەوە و خوا زاناو دانایە(بە بەرژەوەندیەکانتان).

(٦٠) ئەو ئافرەتە پیرو پەککەوتانەی کە بە تەمای شوو کردن نین، قەیناکات ئەگەر هەندێک لە پۆشاکیان دابنێن، لەکاتێکدا جوانی خۆیان دەرنەخەن، خۆ ئەگەر پۆشتە بن ئەوە چاکترە بۆیان، خوایش بیسەرو زانایە (بە نیەت و خەتەرەو خەیاڵی دڵەکان).

(٦١) کوێرو نابینا گوناهو گلەییان لەسەر نییە، هەروەها شەل، نەخۆش، هەروەها خۆیشتان، کە خواردن بخۆن لە ماڵی خۆتان یان ماڵی باوکانتان یان ماڵی دایکانتان، یان ماڵی براکانتان یان ماڵی خوشکەکانتان، یان ماڵی مامەکانتان یان ماڵی پوورەکانتان (خوشکانی باوک)، یان لە ماڵی خاڵەکانتان یان لە ماڵی پوورەکانتان (خوشکانی دایک)، یان ئەو ماڵەی کە کلیلی لای ئێوەیە، یان ماڵی هاوەڵتان، هیچ گوناهتان ناگات کە بە کۆمەڵ (لەسەر یەک سفرە) نان بخۆن یاخود جیا بەجیا، هەرکاتێک چوونە هەر ماڵێک، سەلام لە خۆتان بکەن و سەلام لەیەکتر بکەن، سەلامێک لەلایەن خوای گەورەوە، کە پڕە لە بەرەکەت و فەڕو جوانی و پاکی، ئا بەو شێوەیە خوا ئایەتەکانی خۆیتان بۆ روون دەکاتەوە بۆ ئەوەی بیرو هۆش بکەنەوە و لێکی بدەنەوە (کە چ پەروەردگارێکی دڵسۆزو غەمخوارمان هەیە، چۆن دەیەوێت ژیانمان بەشێوەیەک رێک بخات کە بەخۆشی و شادی پێکەوە بژین، دوور لەگرفت و کێشەی دەروونی و رەوشتی و کۆمەڵایەتی).

إِنَّمَا الْمُؤْمِنُونَ الَّذِينَ آمَنُوا بِاللَّهِ وَرَسُولِهِ وَإِذَا كَانُوا مَعَهُ عَلَىٰ أَمْرٍ جَامِعٍ لَّمْ يَذْهَبُوا حَتَّىٰ يَسْتَأْذِنُوهُ ۚ إِنَّ الَّذِينَ يَسْتَأْذِنُونَكَ أُولَٰئِكَ الَّذِينَ يُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ وَرَسُولِهِ ۚ فَإِذَا اسْتَأْذَنُوكَ لِبَعْضِ شَأْنِهِمْ فَأْذَن لِّمَن شِئْتَ مِنْهُمْ وَاسْتَغْفِرْ لَهُمُ اللَّهَ ۚ إِنَّ اللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿٦٢﴾ لَّا تَجْعَلُوا دُعَاءَ الرَّسُولِ بَيْنَكُمْ كَدُعَاءِ بَعْضِكُم بَعْضًا ۚ قَدْ يَعْلَمُ اللَّهُ الَّذِينَ يَتَسَلَّلُونَ مِنكُمْ لِوَاذًا ۚ فَلْيَحْذَرِ الَّذِينَ يُخَالِفُونَ عَنْ أَمْرِهِ أَن تُصِيبَهُمْ فِتْنَةٌ أَوْ يُصِيبَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿٦٣﴾ أَلَا إِنَّ لِلَّهِ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ ۖ قَدْ يَعْلَمُ مَا أَنتُمْ عَلَيْهِ وَيَوْمَ يُرْجَعُونَ إِلَيْهِ فَيُنَبِّئُهُم بِمَا عَمِلُوا ۗ وَاللَّهُ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمٌ ﴿٦٤﴾

سُورَةُ الفُرْقَان

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ



تَبَارَكَ الَّذِي نَزَّلَ الْفُرْقَانَ عَلَىٰ عَبْدِهِ لِيَكُونَ لِلْعَالَمِينَ نَذِيرًا ﴿١﴾ الَّذِي لَهُ مُلْكُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَلَمْ يَتَّخِذْ وَلَدًا وَلَمْ يَكُن لَّهُ شَرِيكٌ فِي الْمُلْكِ وَخَلَقَ كُلَّ شَيْءٍ فَقَدَّرَهُ تَقْدِيرًا ﴿٢﴾

(٦٢) بەڕاستی ئیمانداران ئەوانەن کە باوەڕیان هێناوە بەخواو بەپێغەمبەرەکەی و هەر کاتێک کۆ دەبنەوە لە خزمەتیدا بۆ کارێکی گرنگ و پێویست کە هاوکاریی دەوێت، ناڕۆن و (خۆیان نادزنەوە) هەتا مۆڵەت نەخوازن، بەڕاستی ئەوانەی کە مۆڵەتت لێ دەخوازن هەر ئەو کەسانەن کە باوەڕیان بەخواو پێغەمبەرەکەی هەیە، هەرکاتێک بۆ کارێکی تایبەتی خۆیان داوای مۆڵەتیان لێکردیت، ئەوە مۆڵەتی ئەوانە بدە کە دەتەوێت و داوای لێ خۆشبوونیشیان لە خوا بۆ بکە، بەڕاستی خوا لێخۆشبوو میهرەبانە.

(٦٣) (ئەی یاوەران) نەکەن بانگی پێغەمبەر بکەن، وەک ئەوەی خۆتان لە نێوان یەکتردا بانگی یەک دەکەن (چونکە دەبێت قەدری پێغەمبەری خوا ﷺ تایبەتی بێت) بێگومان خوا دەزانێت بەوانەی کە خۆیان پەنهان دەکەن و خۆ دەدزنەوە لە کارو فرمان، دەبا ئەوانەی کە سەرپێچی لە فەرمانی دەکەن بترسن لەوەی کە تووشی تاقی کردنەوەیەکی سەخت، یان تووشی سزایەکی بە ئێش ببن.

(٦٤) ئاگاداربن کە هەرچی لە ئاسمانەکان و زەویدا هەیە خوا خاوەنیانە، زۆر بەچاکی دەزانێت ئێوە چی دەکەن و خەریکی چین، ئەو ڕۆژەش کە دەبرێنەوە بۆ لای هەواڵی هەموو ئەو کارانەیان پێ دەڵێت کە ئەنجامیان داوە و خوا هەمیشە بەهەموو شتێک ئاگاو زانایە.

## سورەتی (الفرقان)

به ناوی خوای بەخشندە و میهرەبان

(١) بەرزو پیرۆزو پاک و بڵندە ئەو زاتەی کە قورئانی دابەزاندووە تا ببێتە جیاکەرەوەی ڕاست و ناڕاست، بۆ سەر بەندەی خۆی (محمد ﷺ) تا ببێتە هوشیارکەرەوە و بێدارکەرەوەی دانیشتوانی جیهان لە هەموو سەردەمێکدا.

(٢) ئەو زاتەی کە هەموو ئاسمانەکان و زەوی موڵکی ئەوەو هەر ئەو خاوەنیانە، کەسیشی نەکردووە بە ڕۆڵەی خۆی و کەسی نەکردووە بە شەریک و هاوبەش لە مەودای موڵک و دەسەڵاتیدا، هەموو شتێکی دروستکردووە بەئەندازە و قەبارە و شێوە و تام و بۆن و ڕەنگ و جیاوازی هەمەجۆر..هتد، نەخشەی ڕێک و پێکی بۆ هەموو شتێک داناوە (بە شێوەیەک کە پێویستیەکانی ئادەمیزاد دابین بکەن و لە خزمەتیدا بن).

وَاتَّخَذُوا مِن دُونِهِۦٓ ءَالِهَةً لَّا يَخْلُقُونَ شَيْـًٔا وَهُمْ يُخْلَقُونَ وَلَا يَمْلِكُونَ لِأَنفُسِهِمْ ضَرًّا وَلَا نَفْعًا وَلَا يَمْلِكُونَ مَوْتًا وَلَا حَيَوٰةً وَلَا نُشُورًا ﴿٣﴾ وَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓا۟ إِنْ هَـٰذَآ إِلَّآ إِفْكٌ ٱفْتَرَىٰهُ وَأَعَانَهُۥ عَلَيْهِ قَوْمٌ ءَاخَرُونَ ۖ فَقَدْ جَآءُو ظُلْمًا وَزُورًا ﴿٤﴾ وَقَالُوٓا۟ أَسَـٰطِيرُ ٱلْأَوَّلِينَ ٱكْتَتَبَهَا فَهِىَ تُمْلَىٰ عَلَيْهِ بُكْرَةً وَأَصِيلًا ﴿٥﴾ قُلْ أَنزَلَهُ ٱلَّذِى يَعْلَمُ ٱلسِّرَّ فِى ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۚ إِنَّهُۥ كَانَ غَفُورًا رَّحِيمًا ﴿٦﴾ وَقَالُوا۟ مَالِ هَـٰذَا ٱلرَّسُولِ يَأْكُلُ ٱلطَّعَامَ وَيَمْشِى فِى ٱلْأَسْوَاقِ ۙ لَوْلَآ أُنزِلَ إِلَيْهِ مَلَكٌ فَيَكُونَ مَعَهُۥ نَذِيرًا ﴿٧﴾ أَوْ يُلْقَىٰٓ إِلَيْهِ كَنزٌ أَوْ تَكُونُ لَهُۥ جَنَّةٌ يَأْكُلُ مِنْهَا ۚ وَقَالَ ٱلظَّـٰلِمُونَ إِن تَتَّبِعُونَ إِلَّا رَجُلًا مَّسْحُورًا ﴿٨﴾ ٱنظُرْ كَيْفَ ضَرَبُوا۟ لَكَ ٱلْأَمْثَـٰلَ فَضَلُّوا۟ فَلَا يَسْتَطِيعُونَ سَبِيلًا ﴿٩﴾ تَبَارَكَ ٱلَّذِىٓ إِن شَآءَ جَعَلَ لَكَ خَيْرًا مِّن ذَٰلِكَ جَنَّـٰتٍ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَـٰرُ وَيَجْعَل لَّكَ قُصُورًۢا ﴿١٠﴾ بَلْ كَذَّبُوا۟ بِٱلسَّاعَةِ ۖ وَأَعْتَدْنَا لِمَن كَذَّبَ بِٱلسَّاعَةِ سَعِيرًا ﴿١١﴾

(٣) کەچی هاوەڵگەران لە جیاتی ئەو زاتە شتانێکی تریان کردووە بەخوای خۆیان کە هیچ دروست ناکەن و هیچیان پێ بەدی ناهێنرێت، بەڵکو خۆیان دروست دەکرێن، (تەنانەت) ناتوانن سوودێک یان زەرەرێک بە خۆیان بگەیەنن، هەروەها نە مردنیان بەدەستە، نە ژیان، نە زیندوو کردنەوە.

(٤) ئەوانەی بێ باوەڕ بوون وتویانە: ئەم قورئانە درۆیەک نەبێت کە محمد ﷺ خۆی هەڵی بەستووە، شتێکی تر نییە، کەسانی تریش یارمەتیانداوە، بەڕاستی ئەوانە (بەو گوفتارەیان) ستەم و بوختانێکی گەورە دەکەن و قسەیەکی نارەوایان کردووە.

(٥) هەروەها وتویانە: ئەم قورئانە داستانی پێشینەکانە داوای نووسینەوەیانی کردووە، بەیانیان و ئێواران بەسەریدا دەیخوێننەوە!!

(٦) تۆ ئەی محمد ﷺ بڵێ: ئەو زاتەی ئەم قورئانەی دابەزاندووە بەهەموو نهێنیەک دەزانێت لە ئاسمانەکان و زەویدا، هەر ئەویش هەمیشە و بەردەوام لێخۆشبوو میهرەبانە.

(٧) ئەوانەی بێ باوەڕن دەڵێن: ئەم پێغەمبەرە چییەتی، خواردن دەخوات و بە بازاڕدا دەڕوات و دەگەڕێت، دەبوایە فریشتەیەک بۆ لای دابەزیبایە!! تا ئەویش لەگەڵیدا خەڵکی بێداربکاتەوە و (لەسەرەنجامی سەرپێچی) بیانترسێنێت!!.

(٨) یاخود گەنجینەیەکی لە ئاسمانەوە بۆ فڕێ بدرایە، یاخود باخ و باخات و بێستانێکی تایبەتی ببوایە و لێی بخواردایە، بەڵکو ستەمکاران دەڵێن بە ئیمانداران: ئێوە تەنها شوێن پیاوێکی جادوو لێکراو نەبێت، شوێنی کەسی تر نەکەوتوون؟!

(٩) تەماشاکە و سەرنج بدە (لەو نەفامانە) چۆن نموونە و بیانووت بۆ هێنایەوە، ئەوانە گومڕا بوون و ڕێگەیەک نادۆزنەوە بۆ سەرزەنشت کردنت، یاخود بۆ ڕزگاری و ئاسوودەیی دنیا و قیامەت.

(١٠) (لە حاڵێکدا) ئەو زاتە مەزن و پیرۆزە، زاتێکە کە ئەگەر بیەوێت زۆر لەوەی کە خوانەناسان باسی دەکەن چاکترت پێ دەبەخشێت.. باخ و باخاتی (جوان و ڕازاوەت هەر لە دنیادا بۆ دەڕەخسێنێت) کە چەندەها ڕووبار بەژێر درەختەکانیدا دەڕوات، هەروەها کۆشک و تەلاری بەرزو بڵندت پێ دەبەخشێت.

(١١) نەخێر، (ڕەخنەکانیان بەجێ نییە)، ئەگینا ئەوان بڕوایان هەر بەقیامەت نیە، ئێمەش ئاگری بڵێسەدارمان بۆ ئەوکەسانە ئامادەکردووە کە بڕوایان بە قیامەت نیە.

إِذَا رَأَتْهُم مِّن مَّكَانٍۭ بَعِيدٍ سَمِعُوا۟ لَهَا تَغَيُّظًا وَزَفِيرًا ﴿١٢﴾ وَإِذَآ أُلْقُوا۟ مِنْهَا مَكَانًا ضَيِّقًا مُّقَرَّنِينَ دَعَوْا۟ هُنَالِكَ ثُبُورًا ﴿١٣﴾ لَّا تَدْعُوا۟ ٱلْيَوْمَ ثُبُورًا وَٰحِدًا وَٱدْعُوا۟ ثُبُورًا كَثِيرًا ﴿١٤﴾ قُلْ أَذَٰلِكَ خَيْرٌ أَمْ جَنَّةُ ٱلْخُلْدِ ٱلَّتِى وُعِدَ ٱلْمُتَّقُونَ ۚ كَانَتْ لَهُمْ جَزَآءً وَمَصِيرًا ﴿١٥﴾ لَّهُمْ فِيهَا مَا يَشَآءُونَ خَٰلِدِينَ ۚ كَانَ عَلَىٰ رَبِّكَ وَعْدًا مَّسْـُٔولًا ﴿١٦﴾ وَيَوْمَ يَحْشُرُهُمْ وَمَا يَعْبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ فَيَقُولُ ءَأَنتُمْ أَضْلَلْتُمْ عِبَادِى هَٰٓؤُلَآءِ أَمْ هُمْ ضَلُّوا۟ ٱلسَّبِيلَ ﴿١٧﴾ قَالُوا۟ سُبْحَٰنَكَ مَا كَانَ يَنۢبَغِى لَنَآ أَن نَّتَّخِذَ مِن دُونِكَ مِنْ أَوْلِيَآءَ وَلَٰكِن مَّتَّعْتَهُمْ وَءَابَآءَهُمْ حَتَّىٰ نَسُوا۟ ٱلذِّكْرَ وَكَانُوا۟ قَوْمًۢا بُورًا ﴿١٨﴾ فَقَدْ كَذَّبُوكُم بِمَا تَقُولُونَ فَمَا تَسْتَطِيعُونَ صَرْفًا وَلَا نَصْرًا ۚ وَمَن يَظْلِم مِّنكُمْ نُذِقْهُ عَذَابًا كَبِيرًا ﴿١٩﴾ وَمَآ أَرْسَلْنَا قَبْلَكَ مِنَ ٱلْمُرْسَلِينَ إِلَّآ إِنَّهُمْ لَيَأْكُلُونَ ٱلطَّعَامَ وَيَمْشُونَ فِى ٱلْأَسْوَاقِ ۗ وَجَعَلْنَا بَعْضَكُمْ لِبَعْضٍ فِتْنَةً أَتَصْبِرُونَ ۗ وَكَانَ رَبُّكَ بَصِيرًا ﴿٢٠﴾

(١٢) کاتێک هەر لە دوورەوە ئەو ئاگرە بڵێسەدارە خوانەناسان دەبینێت، دەنگی خەشم و قین و هەناسەی داخ لەدڵی دەبیستن.

(١٣) هەرکاتێک ئەوانە بەکۆت و زنجیرەوە فڕێ دەدرێنە ناو شوێنێکی تەنگەبەرەوە لە دۆزەخدا، داوای مەرگ و تیاچوون دەکەن و مردن بە ئاوات دەخوازن لەوێ.

(١٤) (ئەوسا پێیان دەوترێت) ئەمڕۆ داوای تەنها مردنێک مەکەن، بەڵکو داوای مردنی زۆر بێشومار بکەن و ئاواتی بۆ بخوازن!!

(١٥) ئەی پێغەمبەر ﷺ پێیان بڵێ: باشە، ئەو حاڵە چاکترە، یان بەهەشتی هەمیشە و بەردەوام کە بەڵێن دراوە بەخواناس و پارێزکاران، هەر دەمێکیشە ئامادە کراوە بۆیان، کە پاداشتە و سەرئەنجام.

(١٦) لەو بەهەشتەدا هەرچی داوای بکەن بۆیان ئامادەیە هاوڕێ لەگەڵ ژیانی نەبڕاوەدا، ئەوەش بەڵێنێکە لەلایەن پەروەردگارتەوە و خۆی بەرپرسیار کردووە لێی.

(١٧) رۆژێک دێت خوا بێ باوەڕان کۆدەکاتەوە و هەموو ئەو شتانەش کە لەجیاتی خوا دەیانپەرست، ئەوسا (خوا روو بەپەرستراوەکان) دەفەرموێت: ئایا ئێوە ئەو بەندانەی منتان گومڕا کرد؟ یاخود خۆیان رێبازی راستیان وێڵ کرد و گومڕا بوون؟.

(١٨) لە وەڵامدا دەڵێن: خوایە، پاکی و بێگەردی بۆ تۆیە، هەرگیز رەوا نیە ئێمە جگە لە تۆ کەسێک، یان شتێکی تر بپەرستین یان بیکەینە پشتیوان و یاوەری خۆمان، بەڵام تۆ نازو نیعمەتت بەو خەڵکە گومڕایە و باوو باپیرانیان بەخشی بوو، ئیتر هەموو یاداوەری و یادخستنەوەیەکیان فەرامۆش کرد و بوونە قەومێکی بێ خێر و تیاچوو.

(١٩) (ئەوسا بەسەرگەردانەکان دەوترێت) ئەوەتە پەرستراوەکان گوفتاری ئێوەیان بەدرۆخستەوە، ئیتر نەدەتوانن لە سزای خوابی خۆتان دەرباز بکەن، نەدەتوانن پشتیوانێک بەدەست بهێنن، جا هەرکەستان بیەوێت ستەمێک بکات، ئەوە ئێمە سزایەکی سەخت و گەورە و سامناکی پێ دەچێژین.

(٢٠) ئێمە پێش تۆ (ئەی محمد ﷺ) هیچ کەسێکمان لە پێغەمبەران رەوانە نەکردووە کە خواردنیان نەخواردبێت، یان بە بازاڕدا نەگەڕابن، ئێمە هەندێک لە ئێوەمان کردۆتە هۆی تاقیکردنەوەی هەندێکی ترتان.. ئایا خۆدەگرن و خۆڕاگر دەبن، بێگومان پەروەردگاری تۆ هەمیشە و بەردەوام بینایە (بە هەڵسوکەوتی بەندەکانی).



﴿وَقَالَ الَّذِينَ لَا يَرْجُونَ لِقَاءَنَا لَوْلَا أُنزِلَ عَلَيْنَا الْمَلَائِكَةُ أَوْ نَرَىٰ رَبَّنَا ۗ لَقَدِ اسْتَكْبَرُوا فِي أَنفُسِهِمْ وَعَتَوْ عُتُوًّا كَبِيرًا ﴿٢١﴾ يَوْمَ يَرَوْنَ الْمَلَائِكَةَ لَا بُشْرَىٰ يَوْمَئِذٍ لِّلْمُجْرِمِينَ وَيَقُولُونَ حِجْرًا مَّحْجُورًا ﴿٢٢﴾ وَقَدِمْنَا إِلَىٰ مَا عَمِلُوا مِنْ عَمَلٍ فَجَعَلْنَاهُ هَبَاءً مَّنثُورًا ﴿٢٣﴾ أَصْحَابُ الْجَنَّةِ يَوْمَئِذٍ خَيْرٌ مُّسْتَقَرًّا وَأَحْسَنُ مَقِيلًا ﴿٢٤﴾ وَيَوْمَ تَشَقَّقُ السَّمَاءُ بِالْغَمَامِ وَنُزِّلَ الْمَلَائِكَةُ تَنزِيلًا ﴿٢٥﴾ الْمُلْكُ يَوْمَئِذٍ الْحَقُّ لِلرَّحْمَٰنِ ۚ وَكَانَ يَوْمًا عَلَى الْكَافِرِينَ عَسِيرًا ﴿٢٦﴾ وَيَوْمَ يَعَضُّ الظَّالِمُ عَلَىٰ يَدَيْهِ يَقُولُ يَا لَيْتَنِي اتَّخَذْتُ مَعَ الرَّسُولِ سَبِيلًا ﴿٢٧﴾ يَا وَيْلَتَىٰ لَيْتَنِي لَمْ أَتَّخِذْ فُلَانًا خَلِيلًا ﴿٢٨﴾ لَّقَدْ أَضَلَّنِي عَنِ الذِّكْرِ بَعْدَ إِذْ جَاءَنِي ۗ وَكَانَ الشَّيْطَانُ لِلْإِنسَانِ خَذُولًا ﴿٢٩﴾ وَقَالَ الرَّسُولُ يَا رَبِّ إِنَّ قَوْمِي اتَّخَذُوا هَٰذَا الْقُرْآنَ مَهْجُورًا ﴿٣٠﴾ وَكَذَٰلِكَ جَعَلْنَا لِكُلِّ نَبِيٍّ عَدُوًّا مِّنَ الْمُجْرِمِينَ ۗ وَكَفَىٰ بِرَبِّكَ هَادِيًا وَنَصِيرًا ﴿٣١﴾ وَقَالَ الَّذِينَ كَفَرُوا لَوْلَا نُزِّلَ عَلَيْهِ الْقُرْآنُ جُمْلَةً وَاحِدَةً ۚ كَذَٰلِكَ لِنُثَبِّتَ بِهِ فُؤَادَكَ ۖ وَرَتَّلْنَاهُ تَرْتِيلًا ﴿٣٢﴾

(٢١) ئەوانەی کە بە ئومێدی دیداری ئێمە نین وتیان: ئەوە بۆ فریشتە دانەبەزێنرا بۆ لامان (تا دڵنیابین لە حەقیقەتی قورئان و پێغەمبەر) یاخود پەروەردگارمان بەچاوی خۆمان ببینین، سوێند بە خوا بێگومان ئەوانە لە دەروونی خۆیاندا خۆیان بەگەورە دەزانن، لە سنوور ترازاون و سەرکەشیان بێ ئەندازەیە.

(٢٢) ئەو رۆژەی کە فریشتەکان دەبینن هیچ جۆرە مژدەیەک بۆ تاوانباران نیە (بۆیە بە کزی و خەجاڵەتی و کەساسیەوە) دەڵێن: خۆزگە بۆ پەنایەک، یان شوێنێکی داڵدەدەرو پارێزراو!!

(٢٣) کاتێک هاتین و تەماشای ئەوەمان کرد کە کردوویانە (هەمووی تاوان بوو) بەربامانداو کردمانە تەپوتۆزێکی پەرش و بڵاو.

(٢٤) بەهەشتیەکان لەو رۆژەدا جێگەو رێگەیان زۆر خۆش و رازاوەیە و شوێنی حەوانەوەیان زۆر چاک و لەبارە.

(٢٥) رۆژێک دێت ئاسمان لەت و پەت دەبێت بەهۆی هەورێکی تایبەتیەوە، بەڕاستی فریشتەکانیش دادەبەزێنرێن دەستە دەستە و گرۆ گرۆ بەشێوەیەکی تایبەت.

(٢٦) ئەو رۆژە ئیتر موڵک و دەسەڵاتداری راستەقینە بەدەست خوای میهرەبانە، بێگومان ئەو رۆژە رۆژێکی زۆر سەخت و دژوار دەبێت لەسەر بێ باوەڕ و خوانەناسان (زۆر پەشیمان دەبن).

(٢٧) رۆژێک دێت ستەمکار قەپ دەکات بەهەردوو دەستی خۆیدا و گاز لە هەردوو دەستی خۆی دەگرێت (لە پەشیمانیدا و) دەڵێت: خۆزگە لەگەڵ پێغەمبەردا رێبازی ئیمانم بگرتایە.

(٢٨) مەرگ بۆ خۆم، خۆزگە فلان کەسم نەکردایەتە هاوەڵ و دۆستی خۆم (چونکە سەری لێشێواندم).

(٢٩) بەڕاستی گومڕاو وێڵی کردم لە بەرنامەی خوا دوای ئەوەی کە پێم راگەیەنرا بوو، شەیتان هەمیشە و بەردەوام هانی مرۆڤ دەدات بۆ گوناهو تاوان، لەکاتی تەنگانەشدا پشتی بەردەدات.

(٣٠) (دوای دوورکەوتنەوەی ئوممەت لە قورئان) پێغەمبەر ﷺ سکاڵا دەکات و دەفەرموێت: پەروەردگارا بەڕاستی قەومەکەم وازیان لەم قورئانە هێناوە و پشت گوێیان خستووە و گرنگی پێ نادەن.

(٣١) هەر بەو شێوەیەی (کە تۆ ئەی محمد ﷺ دژایەتی دەکرێیت) بۆ هەر پێغەمبەرێک دوژمن و ملهوڕمان لە تاوانباران فەراهەم هێناوە، (بەڵام دڵنیابە کە) پەروەردگارت بەسە کە رێنموویت بکات و پشتیوانیت لێ بکات.

(٣٢) کافرەکان (بیانوویەکی تریان گرت و) وتیان: ئەوە بۆ قورئان بە یەک کەڕەت بۆی رەوانە ناکرێت، بێگومان ئێمە هەر بەو شێوەیە رەوانەی دەکەین، تا دڵی تۆ زیاتر دڵنیا بکەین، بەردەوام بەجوانی دایدەڕێژین و دەیگەیەنین.

وَلَا يَأْتُونَكَ بِمَثَلٍ إِلَّا جِئْنَٰكَ بِٱلْحَقِّ وَأَحْسَنَ تَفْسِيرًا ﴿٣٣﴾ ٱلَّذِينَ يُحْشَرُونَ عَلَىٰ وُجُوهِهِمْ إِلَىٰ جَهَنَّمَ أُوْلَٰٓئِكَ شَرٌّ مَّكَانًا وَأَضَلُّ سَبِيلًا ﴿٣٤﴾ وَلَقَدْ ءَاتَيْنَا مُوسَى ٱلْكِتَٰبَ وَجَعَلْنَا مَعَهُۥٓ أَخَاهُ هَٰرُونَ وَزِيرًا ﴿٣٥﴾ فَقُلْنَا ٱذْهَبَآ إِلَى ٱلْقَوْمِ ٱلَّذِينَ كَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِنَا فَدَمَّرْنَٰهُمْ تَدْمِيرًا ﴿٣٦﴾ وَقَوْمَ نُوحٍ لَّمَّا كَذَّبُواْ ٱلرُّسُلَ أَغْرَقْنَٰهُمْ وَجَعَلْنَٰهُمْ لِلنَّاسِ ءَايَةً وَأَعْتَدْنَا لِلظَّٰلِمِينَ عَذَابًا أَلِيمًا ﴿٣٧﴾ وَعَادًا وَثَمُودَاْ وَأَصْحَٰبَ ٱلرَّسِّ وَقُرُونًۢا بَيْنَ ذَٰلِكَ كَثِيرًا ﴿٣٨﴾ وَكُلًّا ضَرَبْنَا لَهُ ٱلْأَمْثَٰلَ وَكُلًّا تَبَّرْنَا تَتْبِيرًا ﴿٣٩﴾ وَلَقَدْ أَتَوْاْ عَلَى ٱلْقَرْيَةِ ٱلَّتِيٓ أُمْطِرَتْ مَطَرَ ٱلسَّوْءِ أَفَلَمْ يَكُونُواْ يَرَوْنَهَا بَلْ كَانُواْ لَا يَرْجُونَ نُشُورًا ﴿٤٠﴾ وَإِذَا رَأَوْكَ إِن يَتَّخِذُونَكَ إِلَّا هُزُوًا أَهَٰذَا ٱلَّذِى بَعَثَ ٱللَّهُ رَسُولًا ﴿٤١﴾ إِن كَادَ لَيُضِلُّنَا عَنْ ءَالِهَتِنَا لَوْلَآ أَن صَبَرْنَا عَلَيْهَا وَسَوْفَ يَعْلَمُونَ حِينَ يَرَوْنَ ٱلْعَذَابَ مَنْ أَضَلُّ سَبِيلًا ﴿٤٢﴾ أَرَءَيْتَ مَنِ ٱتَّخَذَ إِلَٰهَهُۥ هَوَىٰهُ أَفَأَنتَ تَكُونُ عَلَيْهِ وَكِيلًا ﴿٤٣﴾

خوانەناسان هیچ رەخنەیەکت لیٚ ناگرن، لە بەرامبەریەوە ئیٚمە حەقیقەت و راستیمان بۆ تۆ نەهیٚنا بیٚت و بەجوانی هەموو شتیٚکت بۆ روون نەکەینەوە.

ئەو تاوانبارانەی (دژایەتی بەرنامەی خوا دەکەن)، لەسەر رووخساریان کیٚش دەکریٚن بۆ دۆزەخ و تیایدا کۆدەکریٚنەوە، ئا ئەوانە ناخۆشترین جیٚگەیان هەیە، چونکە گومراترین ریٚبازیان کاتی خۆی گرتبووە بەر.

سویٚند بە خوا بیٚگومان ئیٚمە کاتی خۆی کتیٚبی تەوراتمان بەخشی بە موسا و هاروونی برایشیمان کردە وەزیرو یاریدەدەری.

ئەوسا پیٚمان وتن: هەردووکتان بچن بۆ سەر ئەو قەومەی کە ئایەتەکانی ئیٚمە بە درۆ دەزانن و بڕوای پیٚ ناکەن (ئەوسا دوای ساڵەها سەرکەشی و یاخی بوون) بە توندو تیژی تیٚکمان شکاندن بەسەر یەکدا و لەناومان بردن.

قەومی ـ نوح ـ یش کاتیٚک بەرنامەی پیٚغەمبەرانیان بەدرۆزانی (چونکە بڕوا نەبوون بە پیٚغەمبەریٚک بڕوا نەبوونە بە هەموویان) ئەوسا ئیٚمە نوقمی زریانەکەمان کردن و کردمانن بە پەندو عیبرەت بۆ خەڵکی و سزایەکی بەئیٚشمان بۆ ستەمکاران ئامادە کردووە.

هەروەها هۆزی عاد و ثمود و خاوەن چاڵ و بیرەکان، چەندەها قەومی زۆری تریش لە نیٚوانیاندا (کە خوانەناس بوون لەناومان بردن، ستەمکارانی هەموو سەردەمیٚک لە دەستی بە توانای ئیٚمە دەرناچن).

بۆ هەموانیان نموونەمان هیٚنایەوە (ساڵەهای دوورو دریٚژ پیٚغەمبەرەکەیان لەناویاندا بوو، بەڵام کە هەر ریٚبازی بیٚباوەڕیان بەرنەدا) هەموانیانمان بەسەختی لەناوبرد و وردو خاشمان کردن.

خۆ (قورەیشیەکان و خەڵکیٚکی زۆر) سەردانی ئەو شارۆچکەیان کردووە کەکاتی خۆی بەرد بارانی سەخت و دژواری بەسەردا باری، ئایا ئاسەواری ئەو کاول کاریەیان نەبینیووە؟ نەخیٚر هۆی نەبینین نیە، بەڵکو ئەوانە بەتەمای لیٚپرسینەوە و زیندوو بوونەوە نین؟

ئەی پیٚغەمبەر کاتیٚک خوانەناسان تۆ دەبینن بیٚجگە لەگاڵتە پیٚکردنت نەبیٚت هیچ ریٚزیٚکت بۆ دانانیٚن دەڵیٚن: ئا ئەمەیە کە خوا کردوویەتی بە پیٚغەمبەرو رەوانەی کردووە؟!

هەروەها دەڵیٚن: خەریٚک بوو لە پەرستنی خواکانمان وێڵمان بکات، ئەگەر ئیٚمە خۆڕاگر نەبووینایە لەسەر پەرستنیان، جا لە داهاتوودا چاک بۆیان دەردەکەویٚت، کاتیٚک کە سزاو ئازار دەبینن کیٚ زۆر گومڕاو سەرلیٚشیٚواوە؟!

ئایا نابینیت ئەو کەسەی کە ئارەزووی خۆی کردۆتە خوای خۆی (شویٚنی نەفسی بەد کرداری کەوتووە) ئایا تۆ دەتوانیت ئەوانە بپاریٚزیت لەلادان و سەرکەشی؟! (یاخود سنووریٚکیان بۆ دابنیٚیت؟ خەمت نەبیٚت بۆ کویٚ دەچن؟)

أَمْ تَحْسَبُ أَنَّ أَكْثَرَهُمْ يَسْمَعُونَ أَوْ يَعْقِلُونَ ۚ إِنْ هُمْ إِلَّا كَالْأَنْعَامِ ۖ بَلْ هُمْ أَضَلُّ سَبِيلًا ﴿٤٤﴾ أَلَمْ تَرَ إِلَىٰ رَبِّكَ كَيْفَ مَدَّ الظِّلَّ وَلَوْ شَاءَ لَجَعَلَهُ سَاكِنًا ثُمَّ جَعَلْنَا الشَّمْسَ عَلَيْهِ دَلِيلًا ﴿٤٥﴾ ثُمَّ قَبَضْنَاهُ إِلَيْنَا قَبْضًا يَسِيرًا ﴿٤٦﴾ وَهُوَ الَّذِي جَعَلَ لَكُمُ اللَّيْلَ لِبَاسًا وَالنَّوْمَ سُبَاتًا وَجَعَلَ النَّهَارَ نُشُورًا ﴿٤٧﴾ وَهُوَ الَّذِي أَرْسَلَ الرِّيَاحَ بُشْرًا بَيْنَ يَدَيْ رَحْمَتِهِ ۚ وَأَنْزَلْنَا مِنَ السَّمَاءِ مَاءً طَهُورًا ﴿٤٨﴾ لِنُحْيِيَ بِهِ بَلْدَةً مَيْتًا وَنُسْقِيَهُ مِمَّا خَلَقْنَا أَنْعَامًا وَأَنَاسِيَّ كَثِيرًا ﴿٤٩﴾ وَلَقَدْ صَرَّفْنَاهُ بَيْنَهُمْ لِيَذَّكَّرُوا فَأَبَىٰ أَكْثَرُ النَّاسِ إِلَّا كُفُورًا ﴿٥٠﴾ وَلَوْ شِئْنَا لَبَعَثْنَا فِي كُلِّ قَرْيَةٍ نَذِيرًا ﴿٥١﴾ فَلَا تُطِعِ الْكَافِرِينَ وَجَاهِدْهُمْ بِهِ جِهَادًا كَبِيرًا ﴿٥٢﴾ ۞  وَهُوَ الَّذِي مَرَجَ الْبَحْرَيْنِ هَٰذَا عَذْبٌ فُرَاتٌ وَهَٰذَا مِلْحٌ أُجَاجٌ وَجَعَلَ بَيْنَهُمَا بَرْزَخًا وَحِجْرًا مَحْجُورًا ﴿٥٣﴾ وَهُوَ الَّذِي خَلَقَ مِنَ الْمَاءِ بَشَرًا فَجَعَلَهُ نَسَبًا وَصِهْرًا ۗ وَكَانَ رَبُّكَ قَدِيرًا ﴿٥٤﴾ وَيَعْبُدُونَ مِنْ دُونِ اللَّهِ مَا لَا يَنْفَعُهُمْ وَلَا يَضُرُّهُمْ ۗ وَكَانَ الْكَافِرُ عَلَىٰ رَبِّهِ ظَهِيرًا ﴿٥٥﴾

ئایا وادەزانیت زۆربەی ئەوانە راستیەکان دەبیستن، یان بیروهۆشیان دەخەنە کار؟ ئەوانە مالآت نەبێت، هیچی ترنین، بەڵکو گومراتریشن لە مالآت.

ئایا نابینیت چۆن پەروەردگارت سێبەر درێژ دەکاتەوە، ئەگەر بیویستایە جێگیری دەکرد، پاشان خۆریشمان کردووە بەبەڵگەو نیشانە لەسەر سێبەر (بەو هۆیەوە دیمەنی جوانی جۆراوجۆر بەدروست کراوان دەبەخشین).

لەوەودوا بەشێنەیی ئەو سێبەرە بۆ لای خۆمان دەگێرینەوە و دەیگرینەوە (دیارە کە خوا دەیەوێت لە رێگەی ئەو دیاردەیەوە زاتی مەزنی فەرامۆش نەکەین).

هەر ئەو زاتەیە کە شەوی کردووە بە پۆشاک بۆتان و خەویشی کردووە بەهۆی ماتیی و بێ دەنگیی و نارامیی و رۆژیشی کردووە بەهۆی بلاوبوونەوە و کارو کۆشش.

هەر ئەو زاتەیە کە بای شەماڵ دەنێرێت کە مژدەیەکە لەلایەن خوای میهرەبانەوە، (ئینجا دەفەرموێت): ئێمەش لە ئاسمانەوە ئاوێکی پاک و خاوێنمان باراندووە (بەشێوەی باران و بەفرو تەرزە)...

تا بەهۆیەوە سەر زەوی نیشتمانی مردوو زیندوو بکەینەوە، هەتا ئاوی خواردنەوەش ببەخشین بە مالآت و خەڵکانێکی زۆر کە دروستمان کردوون.

سوێند بە خوا ئێمە قورئانمان راگەیاندوە و بە چەندەها شێوە خستومانەتە بەردەمیان تا یاداوەری وەربگرن، کەچی زۆربەی خەڵکی هەر رێبازی بێباوەڕی دەگرنە بەر، هەر شوێنی بێباوەڕی دەکەون و هیچی تر.

خۆ ئەگەر بمانویستایە بۆ هەر شارو شارۆچکەیەک پێغەمبەرێک و یادخەرەوەیەکمان رەوانە دەکرد.

(تۆ ئەی پێغەمبەر بەردەوام بە لەسەر گەیاندنی پەیامەکەت) و بەگوێی بێباوەڕان مەکە و ملکەچیان مەبە و بەم قورئانە هەوڵ و کۆشش و خەباتێکی گەورەیان لەگەڵدا بکە.

هەر ئەو زاتەیە کە ئاوی دوو دەریا یان دوو رووبار لەپاڵ یەکدا (وەک خۆیان دەهێڵێتەوە و تێکەڵ نابن، چونکە چریان جیاوازە)، ئەمەیان شیرین و خۆش و سازگار، ئەوی تریان تفت و تاڵە، لەنێوانیاندا بەربەست و کۆسپی فەراهەم هێناوە ناهێڵێت تێکەڵ ببن.

هەر ئەو زاتەیە کە لە ئاوی (مەنی) بەشەر دروست دەکات (لەوەودواش زۆربەی پێکهاتەی لەشی هەر ئاوە) و کردوویەتی بەهۆی خزمایەتی (لە رێگەی پیاوەوە کۆمەڵێک خزم دروست دەبێت هەروەها لە رێگەی ئافرەتەوە کۆمەڵێک)، بێگومان پەروەردگاری تۆ بەردەوام دەسەلآتی بێسنوورە (لە هەموو بوارێکدا).

خوانەناسان لەجیاتی خوا شتێک دەپەرستن کە نە سوودیان پێدەگەیەنێت نە زیان و هەمیشە و بەردەوام بێباوەڕ دژ بەبەرنامەی پەروەردگاری دەوەستێت.

وَمَآ أَرْسَلْنَٰكَ إِلَّا مُبَشِّرًا وَنَذِيرًا ﴿٥٦﴾ قُلْ مَآ أَسْـَٔلُكُمْ عَلَيْهِ مِنْ أَجْرٍ إِلَّا مَن شَآءَ أَن يَتَّخِذَ إِلَىٰ رَبِّهِۦ سَبِيلًا ﴿٥٧﴾ وَتَوَكَّلْ عَلَى ٱلْحَىِّ ٱلَّذِى لَا يَمُوتُ وَسَبِّحْ بِحَمْدِهِۦ ۚ وَكَفَىٰ بِهِۦ بِذُنُوبِ عِبَادِهِۦ خَبِيرًا ﴿٥٨﴾ ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَا فِى سِتَّةِ أَيَّامٍ ثُمَّ ٱسْتَوَىٰ عَلَى ٱلْعَرْشِ ۚ ٱلرَّحْمَٰنُ فَسْـَٔلْ بِهِۦ خَبِيرًا ﴿٥٩﴾ وَإِذَا قِيلَ لَهُمُ ٱسْجُدُوا۟ لِلرَّحْمَٰنِ قَالُوا۟ وَمَا ٱلرَّحْمَٰنُ أَنَسْجُدُ لِمَا تَأْمُرُنَا وَزَادَهُمْ نُفُورًا ۩ ﴿٦٠﴾ تَبَارَكَ ٱلَّذِى جَعَلَ فِى ٱلسَّمَآءِ بُرُوجًا وَجَعَلَ فِيهَا سِرَٰجًا وَقَمَرًا مُّنِيرًا ﴿٦١﴾ وَهُوَ ٱلَّذِى جَعَلَ ٱلَّيْلَ وَٱلنَّهَارَ خِلْفَةً لِّمَنْ أَرَادَ أَن يَذَّكَّرَ أَوْ أَرَادَ شُكُورًا ﴿٦٢﴾ وَعِبَادُ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلَّذِينَ يَمْشُونَ عَلَى ٱلْأَرْضِ هَوْنًا وَإِذَا خَاطَبَهُمُ ٱلْجَٰهِلُونَ قَالُوا۟ سَلَٰمًا ﴿٦٣﴾ وَٱلَّذِينَ يَبِيتُونَ لِرَبِّهِمْ سُجَّدًا وَقِيَٰمًا ﴿٦٤﴾ وَٱلَّذِينَ يَقُولُونَ رَبَّنَا ٱصْرِفْ عَنَّا عَذَابَ جَهَنَّمَ ۖ إِنَّ عَذَابَهَا كَانَ غَرَامًا ﴿٦٥﴾ إِنَّهَا سَآءَتْ مُسْتَقَرًّا وَمُقَامًا ﴿٦٦﴾ وَٱلَّذِينَ إِذَآ أَنفَقُوا۟ لَمْ يُسْرِفُوا۟ وَلَمْ يَقْتُرُوا۟ وَكَانَ بَيْنَ ذَٰلِكَ قَوَامًا ﴿٦٧﴾




- ئەی محمد تۆمان رەوانە نەکردووە، مەگەر بۆ ئەوەی کە مژدەدەر بیت (بە ئیمانداران) ترسێنەر بیت (بۆ بێباوەڕان).

بەو خەڵکە بڵێ: من هیچ کرێ و پاداشتێکم لە ئێوە ناوێت جگە لەوە کە ڕێ نیشاندەرم بۆ ئەو کەسەی دەیەوێت ڕێگە بەرەو لای پەروەردگاری بگرێتەبەرو مەبەستی ڕەزامەندی ئەو بێت.

تۆ ئەی محمد ، پشت ببەستە بەو زاتەی کە هەمیشە زیندووە و هەرگیز نامرێت، بەردەوام تەسبیحات و سوپاس و ستایشی بکە، ئەوەندە بەسە بۆ ئەو زاتە کە بەهەموو گوناهو تاوانی بەندەکانی ئاگایە و (هیچی لێ پەنهان نیە).

ئەو زاتەی کە ئاسمانەکان و زەوی و هەرچی وا لە نێوانیاندایە لەماوەی شەش ڕۆژدا دروستی کردووە، لەوەودوا لەسەر عەرش و تەختی فەرمانڕەوایی وەستاوە (سەرنجی ئایەتی -٢- سورەتی - الرعد - بدە)، خوا پەروەردگارێکی میهرەبانە، (جا بۆ تێگەیشتن لە وردەکاری و گرنگی بەدیهێنراوەکانی لە جیهانی ئەستێرەکان و کۆمەڵەی خۆر و ئادەمیزاد و گیانلەبەران و رووەک و..هتد) لە کەسێکی ئاگاو زانا بپرسە!!

کاتێک بە خوانەناسان بوترێت سوژدە بەرن بۆ خوای میهرەبان (ئەو نەفامانە بەسەرکەشیەوە) دەڵێن: ڕەحمان کێیە؟ خوای میهرەبان کامەیە؟ ئایا سوژدە بەرین بۆ کەسێک کە تۆ فەرمانمان پێ دەدەیت؟! تا بێت فەرمانی خوا زیاتر ئەوانە تەرە و وێڵ دەکات.

زۆر گەورەو مەزنە ئەو زاتەی لە ئاسماندا چەندەها خولگەی گەورەی (بۆ هەسارە و ئەستێرەکان) بەدیهێناوە، هەروەها چرایەکی پرشنگدار، کە خۆرە و مانگێکی روناکیشی بۆ زەوی دابین کردووە.

(٦٢) خوا؛ ئەو زاتەیە کە شەو و ڕۆژی بەشوێن یەکدا ڕێکخستووە کە فرسەتێکە بۆ ئەو کەسەی کە دەیەوێت یاداوەری وەربگرێت و دەیەوێت سوپاسگوزاریی ئەنجام بدات.

(٦٣) بەندەکانی خوای میهرەبان ئەو کەسانەن کە زۆر بە هێمنی و سەلاری بەسەر زەویدا دەڕۆن، کاتێکیش نەفامان بە قسەو قسەڵۆکی ناخۆش بەرەنگاریان دەبن، لە وەڵامیاندا دەڵێن: سڵاو (ڕەوشت بەرزی خۆیان دەنوێنن).

(٦٤) ئەوانەی کە شەوگار بۆ پەروەردگاریان بە سوژدە و وەستان و نوێژ دەبەنە سەر.

(٦٥) ئەوانەی کە دەڵێن: پەروەردگارا، لە سزای ئاگری دۆزەخ بەدوورمان بکە و پەنامان بدە، چونکە سزاو ئازاری لە کۆڵ نابێتەوە و بەردەوامە (بۆ ئەو کەسەی کە خوانەناس و یاخیە).

(٦٦) بەراستی ئەو دۆزەخە شوێن و نیشتەجێیەکی زۆر ناخۆش و ناسازە (ئاهو ناڵەو پەشیمانی بێسنوورە تیایدا).

(٦٧) (هەروەها بەندەکانی خوای میهرەبان) ئەوانەن کە: کاتێک ماڵ و سامانیان دەبەخشن و خەرجی دەکەن، نە زیادەڕەوی تێدا دەکەن و بەزایەی دەدەن، نەدەست نوقاو و ڕەزیلیشن، بەڵکو لەو نێوانەدان (مام ناوەندین و لە شتی بەسوودا بەکاری دەهێنن).

وَٱلَّذِينَ لَا يَدۡعُونَ مَعَ ٱللَّهِ إِلَٰهًا ءَاخَرَ وَلَا يَقۡتُلُونَ ٱلنَّفۡسَ ٱلَّتِي حَرَّمَ ٱللَّهُ إِلَّا بِٱلۡحَقِّ وَلَا يَزۡنُونَۚ وَمَن يَفۡعَلۡ ذَٰلِكَ يَلۡقَ أَثَامًا ﴿٦٨﴾ يُضَٰعَفۡ لَهُ ٱلۡعَذَابُ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ وَيَخۡلُدۡ فِيهِۦ مُهَانًا ﴿٦٩﴾ إِلَّا مَن تَابَ وَءَامَنَ وَعَمِلَ عَمَلًا صَٰلِحًا فَأُوْلَٰٓئِكَ يُبَدِّلُ ٱللَّهُ سَيِّـَٔاتِهِمۡ حَسَنَٰتٖۗ وَكَانَ ٱللَّهُ غَفُورًا رَّحِيمًا ﴿٧٠﴾ وَمَن تَابَ وَعَمِلَ صَٰلِحًا فَإِنَّهُۥ يَتُوبُ إِلَى ٱللَّهِ مَتَابًا ﴿٧١﴾ وَٱلَّذِينَ لَا يَشۡهَدُونَ ٱلزُّورَ وَإِذَا مَرُّواْ بِٱللَّغۡوِ مَرُّواْ كِرَامًا ﴿٧٢﴾ وَٱلَّذِينَ إِذَا ذُكِّرُواْ بِـَٔايَٰتِ رَبِّهِمۡ لَمۡ يَخِرُّواْ عَلَيۡهَا صُمّٗا وَعُمۡيَانًا ﴿٧٣﴾ وَٱلَّذِينَ يَقُولُونَ رَبَّنَا هَبۡ لَنَا مِنۡ أَزۡوَٰجِنَا وَذُرِّيَّٰتِنَا قُرَّةَ أَعۡيُنٖ وَٱجۡعَلۡنَا لِلۡمُتَّقِينَ إِمَامًا ﴿٧٤﴾ أُوْلَٰٓئِكَ يُجۡزَوۡنَ ٱلۡغُرۡفَةَ بِمَا صَبَرُواْ وَيُلَقَّوۡنَ فِيهَا تَحِيَّةٗ وَسَلَٰمًا ﴿٧٥﴾ خَٰلِدِينَ فِيهَاۚ حَسُنَتۡ مُسۡتَقَرّٗا وَمُقَامٗا ﴿٧٦﴾ قُلۡ مَا يَعۡبَؤُاْ بِكُمۡ رَبِّي لَوۡلَا دُعَآؤُكُمۡۖ فَقَدۡ كَذَّبۡتُمۡ فَسَوۡفَ يَكُونُ لِزَامَۢا ﴿٧٧﴾




هەروەها ئەوانەی هیچ جۆرە خوایەكی تـر لەگەڵ خوادا ناپەرستن، كەسیش ناكوژن كە خـوا كوشتنی حـەرام كردبێـت مەگـەر بەحـەق و رەوا، هەروەها زینا ناكەن و نزیكی ناكەون، جا ئـەوەی ئـەو جـۆرە كـارە خراپانـە ئـەنجام بـدات، ئـەوە تووشی سزا و ئازار و ریسوایی دەبێت.

لـە قیامەتیشدا ئـازارو سـزای بـۆ چـەند بەرابـەر دەكرێـت و بـەزەلیلی و خەجاڵـەتی و شەرمەزارییەوە دەبێت ژیانی تێدا بەرێتە سەر.

مەگـەر ئـەو كەسـەی كـە تـەوبـە بكـات و بـاوەڕ بـهێنێت و كـارو كـردەوەی چاكـە ئـەنجام بدات، ئا ئەو جـۆرە كەسـانە خـوا كـارو كـردەوە خراپەكانیشیان بـۆ دەگۆڕێـت بـە چاكـە، چونكـە هەمیشە و بەردەوام خـوا لێخۆشـبوو میهرەبانـە (بەرامبەر خەڵكی بەگشتی و ئەو جۆرە كەسـانە بەتایبەتی).

جا ئـەوەی كـە تـەوبــە دەكـات و كـارو كـردەوەی چاكـە ئـەنجام دەدات و بەتەمایــە پـەروەردگار تەوبەكـەی لێـوە ربگرێـت؛ ئـەوە بێگومان دەگەڕێتەوە بۆ لای خوا بـە تـەوبەیـەكی راست و دروستەوە.

(٧٢) (بەندەكانی خوای میهرەبان) ئەوانەشن كە شایەتی ناحەق نادەن، هەرگیز لە شوێنێكدا ئامـادە نابن كە شایەتی ناحەقی تێدا ئەنجام دەدرێت و یان درۆی تیادا دەكرێـت، كـاتێكیش بـەلای گـەمـە و گاڵە و چەپۆكانی نەفامانـدا تێدەپەڕن، بەهێمنی و لەسەرخۆیی و سەربەرزییەوە تێدەپەڕن.

(٧٣) هەروەها ئەوانەشن؛ كاتێك بە ئایەت و فەرمانەكانی پەروەردگاریان بێدار بكرێنەوە، هەروا بـەكـەڕی و كوێـری بەلایدا تێناپەڕن (بەڵكو تێدەفكرن و لێكی دەدەنەوە و پاشان پەیڕەوی دەكەن).

(٧٤) ئەوانەشن كە دەڵێـن: پـەروەردگارا لـە هاوسـەران و نـەوەكانمان كەسـانێكمان پـێ ببەخشـە كـە ببنـە مایـەی رووناكی دیدەمان و شادمانی دڵمان و بمان كە بە پێشەوا بۆ پارێزكاران و خواناسان.

(٧٥) ئەو جـۆرە كەسـانەی (كـە باسـكران) پاداشـتیان ژوورە (رازاوە و بـەرزو خۆشـەكانی بەهەشـتە) لـە بەرامبـەر خۆگرتن و نارامگرتنیانەوە، جا لەوێ بە سڵاو و درووود پێشوازییان لێدەكرێت (بۆ هەمیشە دەحەوێنەوە تیایدا).

(٧٦) بێگومان لـەناو ژوورەكـانی بەهەشـتەدا ژیـانی كامـەرانی بـەردەوام دەبەنـە سـەر، بەراسـتی جێگـە و رێگـە و نیشتەجێیەكی خۆش و سازگار و رازاوەیە.

(٧٧) تۆ ئەی محمد ﷺ پێیان بڵێ: (خەڵكینە) پەروەردگارم هیچ گوێتـان پـێ نـادات و نرختـان بـۆ دانـانێت، ئەگـەر دوعا و نزاو خواپەرستیتان نەبێت، كەچی زۆربەتان هەر پێغەمبەر و قورئانتان بەدرۆزانی، ئەگەر بەردەوام وابـن، ئـەوا سزاو تۆڵەی خوایی لەئایندەدا یەخەتان پێ دەگرێت و لە كۆڵتان نابێتەوە.



بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

طسٓمٓ ﴿١﴾ تِلْكَ ءَايَٰتُ ٱلْكِتَٰبِ ٱلْمُبِينِ ﴿٢﴾ لَعَلَّكَ بَٰخِعٌ نَّفْسَكَ أَلَّا يَكُونُوا۟ مُؤْمِنِينَ ﴿٣﴾ إِن نَّشَأْ نُنَزِّلْ عَلَيْهِم مِّنَ ٱلسَّمَآءِ ءَايَةً فَظَلَّتْ أَعْنَٰقُهُمْ لَهَا خَٰضِعِينَ ﴿٤﴾ وَمَا يَأْتِيهِم مِّن ذِكْرٍ مِّنَ ٱلرَّحْمَٰنِ مُحْدَثٍ إِلَّا كَانُوا۟ عَنْهُ مُعْرِضِينَ ﴿٥﴾ فَقَدْ كَذَّبُوا۟ فَسَيَأْتِيهِمْ أَنۢبَٰٓؤُا۟ مَا كَانُوا۟ بِهِۦ يَسْتَهْزِءُونَ ﴿٦﴾ أَوَلَمْ يَرَوْا۟ إِلَى ٱلْأَرْضِ كَمْ أَنۢبَتْنَا فِيهَا مِن كُلِّ زَوْجٍ كَرِيمٍ ﴿٧﴾ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَةً ۖ وَمَا كَانَ أَكْثَرُهُم مُّؤْمِنِينَ ﴿٨﴾ وَإِنَّ رَبَّكَ لَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلرَّحِيمُ ﴿٩﴾ وَإِذْ نَادَىٰ رَبُّكَ مُوسَىٰٓ أَنِ ٱئْتِ ٱلْقَوْمَ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿١٠﴾ قَوْمَ فِرْعَوْنَ ۚ أَلَا يَتَّقُونَ ﴿١١﴾ قَالَ رَبِّ إِنِّىٓ أَخَافُ أَن يُكَذِّبُونِ ﴿١٢﴾ وَيَضِيقُ صَدْرِى وَلَا يَنطَلِقُ لِسَانِى فَأَرْسِلْ إِلَىٰ هَٰرُونَ ﴿١٣﴾ وَلَهُمْ عَلَىَّ ذَنۢبٌ فَأَخَافُ أَن يَقْتُلُونِ ﴿١٤﴾ قَالَ كَلَّا ۖ فَٱذْهَبَا بِـَٔايَٰتِنَآ ۖ إِنَّا مَعَكُم مُّسْتَمِعُونَ ﴿١٥﴾ فَأْتِيَا فِرْعَوْنَ فَقُولَآ إِنَّا رَسُولُ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿١٦﴾ أَنْ أَرْسِلْ مَعَنَا بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ ﴿١٧﴾ قَالَ أَلَمْ نُرَبِّكَ فِينَا وَلِيدًا وَلَبِثْتَ فِينَا مِنْ عُمُرِكَ سِنِينَ ﴿١٨﴾ وَفَعَلْتَ فَعْلَتَكَ ٱلَّتِى فَعَلْتَ وَأَنتَ مِنَ ٱلْكَٰفِرِينَ ﴿١٩﴾

سوره‌تی (الشعراء)

به‌ناوی خوای به‌خشنده و میهره‌بان

(١) سه‌رنجی سه‌ره‌تای سووره‌تی (البقرة) بده.

(٢) ئه‌و سووره‌ته چه‌ندین ئایه‌ته له ئایه‌کانی قورئانی ئاشکراو روون.

(٣) ئه‌ی پێغه‌مبه‌رﷺ خه‌ریکیت له داخ و خه‌فه‌تدا خۆت ده‌فه‌وتێنیت کاتێک ده‌بینیت خوانه‌ناسان باوه‌ڕ ناهێنن.

(٤) خۆ ئه‌گه‌ر بمانه‌وێت موعجیزه‌یه‌کیان له ئاسمانه‌وه بۆ داده‌به‌زێنین ئه‌وسا به‌رده‌وام گه‌ردنیان بۆی ملکه‌چ و زه‌لیل ده‌بێت.

(٥) هیچ یادخستنه‌وه و ئامۆژگاریه‌کی گۆیا له خوای میهره‌بانه‌وه بۆیان نه‌هاتووه، پشتیان تێ نه‌کردبێت و سه‌رپێچیان لێ نه‌کردبێت.

(٦) بێگومان ئه‌وانه (به‌رنامه‌ی ئێمه‌یان) به‌درۆ زانی، له‌ئاینده‌یه‌کی نزیکدا هه‌واڵی هه‌موو ئه‌و سه‌ره‌نجامه‌یان پێ ده‌گات، که گاڵته‌یان پێ ده‌کرد.

(٧) ئایا سه‌رنجی زه‌وییان نه‌داوه و لێی ورد نه‌بونه‌ته‌وه، چه‌نده‌ها جووت گژوگیاو رووه‌کی به نرخی هه‌مه‌جۆرو و رازاوه‌مان تێدا رواندووه.

(٨) به‌ڕاستی ئا له‌وه‌دا به‌ڵگه و نیشانه‌ی (به‌هێز هه‌یه له‌سه‌ر ده‌سه‌ڵاتی خوای په‌روه‌ردگار) که‌چی زۆربه‌یان باوه‌ڕدار نه‌بوون.

(٩) به‌ڕاستی هه‌ر په‌روه‌ردگاری تۆ (ئه‌ی محمدﷺ، ئه‌ی ئیماندار) باڵاده‌سته (به‌سه‌ر بێ باوه‌ڕاندا) به‌سۆزو میهره‌بانیشه (به ئیمانداران).

(١٠) (بیریان بخه‌ره‌وه) کاتێک په‌روه‌ردگارت (له لاپاڵی کێوی طوردا) فه‌رمانیدا به موسا که بچۆ بۆ لای قه‌ومی سته‌مکارو سته‌م پیشه...

(١١) که قه‌ومی فیرعه‌ونه... وه پێیان بڵێت: ئایا له خوا ناترسن؟ پارێزکار نابن؟

(١٢) موسا وتی: په‌روه‌ردگارا، بێگومان من ده‌ترسم بڕوام پێ نه‌که‌ن...

(١٣) ته‌نگه نه‌فه‌س و سینه ته‌نگیش ببم و زمانم پاراو نه‌بێت، به‌ڵکو په‌یام بۆ هاروونی براشم بنێریت (تا هاوکاریم بکات و یاریده‌ده‌رم بێت)...

(١٤) تۆڵه‌ی تاوانێکیشان وا به‌سه‌رمه‌وه (کاتێک به‌هه‌ڵه قبطیه‌که‌م کوشت) بۆیه ده‌ترسم بمکوژنه‌وه...

(١٥) خوا فه‌رمووی: نه‌خێر (ناتوانن بتکوژن)، که‌واته برۆن هه‌ردووکتان هاوڕێ له‌گه‌ڵ موعجیزه‌کانماندا، ئێمه به‌ڕاستی له‌گه‌ڵتاندایین و چاودێرو گوێگرین...

(١٦) بچن بۆ لای فیرعه‌ون و بڵێن: ئێمه به‌ڕاستی هه‌ردووکمان نێردراوی په‌روه‌ردگاری جیهانیانین...

(١٧) داوات لێ ده‌که‌ین که ده‌ستبه‌رداری نه‌وه‌ی ئیسرائیل ببیت و ئازادیان بکه‌یت با له‌گه‌ڵ ئێمه‌دا بن...

(١٨) کاتێک موسا و هاروون په‌یامی خوایان گه‌یاند، فیرعه‌ون به موسای وت: (ئه‌مه پاداشتی پیاوه‌تی یه) ئایا ئێمه به منداڵی به‌خێومان نه‌کردیت؟ چه‌نده‌ها ساڵی ته‌مه‌نت له‌ناوماندا نه‌برده‌سه‌ر؟...

(١٩) نه‌وه‌شت کرد که کردت (مه‌به‌ستی کوشتنی قبطیه‌که‌یه) دیاره که تۆ له ریزی ئه‌و که‌سانه‌دایت که ناشوکرن و پاداشتی پیاوه‌تی نازانن...

قَالَ فَعَلْتُهَآ إِذًا وَأَنَا۠ مِنَ ٱلضَّآلِّينَ ﴿٢٠﴾ فَفَرَرْتُ مِنكُمْ لَمَّا خِفْتُكُمْ فَوَهَبَ لِى رَبِّى حُكْمًا وَجَعَلَنِى مِنَ ٱلْمُرْسَلِينَ ﴿٢١﴾ وَتِلْكَ نِعْمَةٌ تَمُنُّهَا عَلَىَّ أَنْ عَبَّدتَّ بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ ﴿٢٢﴾ قَالَ فِرْعَوْنُ وَمَا رَبُّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٢٣﴾ قَالَ رَبُّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَمَا بَيْنَهُمَآ ۖ إِن كُنتُم مُّوقِنِينَ ﴿٢٤﴾ قَالَ لِمَنْ حَوْلَهُۥٓ أَلَا تَسْتَمِعُونَ ﴿٢٥﴾ قَالَ رَبُّكُمْ وَرَبُّ ءَابَآئِكُمُ ٱلْأَوَّلِينَ ﴿٢٦﴾ قَالَ إِنَّ رَسُولَكُمُ ٱلَّذِىٓ أُرْسِلَ إِلَيْكُمْ لَمَجْنُونٌ ﴿٢٧﴾ قَالَ رَبُّ ٱلْمَشْرِقِ وَٱلْمَغْرِبِ وَمَا بَيْنَهُمَآ ۖ إِن كُنتُمْ تَعْقِلُونَ ﴿٢٨﴾ قَالَ لَئِنِ ٱتَّخَذْتَ إِلَٰهًا غَيْرِى لَأَجْعَلَنَّكَ مِنَ ٱلْمَسْجُونِينَ ﴿٢٩﴾ قَالَ أَوَلَوْ جِئْتُكَ بِشَىْءٍ مُّبِينٍ ﴿٣٠﴾ قَالَ فَأْتِ بِهِۦٓ إِن كُنتَ مِنَ ٱلصَّٰدِقِينَ ﴿٣١﴾ فَأَلْقَىٰ عَصَاهُ فَإِذَا هِىَ ثُعْبَانٌ مُّبِينٌ ﴿٣٢﴾ وَنَزَعَ يَدَهُۥ فَإِذَا هِىَ بَيْضَآءُ لِلنَّٰظِرِينَ ﴿٣٣﴾ قَالَ لِلْمَلَإِ حَوْلَهُۥٓ إِنَّ هَٰذَا لَسَٰحِرٌ عَلِيمٌ ﴿٣٤﴾ يُرِيدُ أَن يُخْرِجَكُم مِّنْ أَرْضِكُم بِسِحْرِهِۦ فَمَاذَا تَأْمُرُونَ ﴿٣٥﴾ قَالُوٓا۟ أَرْجِهْ وَأَخَاهُ وَٱبْعَثْ فِى ٱلْمَدَآئِنِ حَٰشِرِينَ ﴿٣٦﴾ يَأْتُوكَ بِكُلِّ سَحَّارٍ عَلِيمٍ ﴿٣٧﴾ فَجُمِعَ ٱلسَّحَرَةُ لِمِيقَٰتِ يَوْمٍ مَّعْلُومٍ ﴿٣٨﴾ وَقِيلَ لِلنَّاسِ هَلْ أَنتُم مُّجْتَمِعُونَ ﴿٣٩﴾

(٢٠) موسا وتی: ئەو کاتە ئەوەمکرد، لە نەزانەکان بووم، (نەمدەزانی بەوە دەمرێت)...

(٢١) ئینجا ئەوەبوو لە دەست ئێوە هەڵاتم کاتێک ترسام (لەسەر کوشتنێکی هەڵە بمکوژنەوە)، ئیتر پەروەردگارم دانایی پێبەخشیووم و کردوومی بەیەکێک لەپێغەمبەران.

(٢٢) جا ئەوە نازو نیعمەتە منەتم بەسەردا دەکەیت کە تۆ نەوەی ئیسرائیلت کردۆتە بەندەی خۆت و زەلیلت کردوون؟ (چونکە بەهۆی ستەمی تۆوە من لە ماڵی ئێوەدا بەخێوکرام).

(٢٣) ئینجا فیرعەون وتی: باشە، پەروەردگاری جیهانەکان چی‌یە و کێ‌یە؟...

(٢٤) موسا وتی: ئەو پەروەردگارە، بەدیهێنەری هەموو ئاسمانەکان و زەویەو هەرچیش وا لە نێوانیاندایە ئەگەر ئێوە بڕوا دەکەن و دڵنیا دەبن.

(٢٥) (فیرعەون بە لە خۆبایی بوونێکەوە) بەوانەی دەوروبەری وت: ئەوە گوێ ناگرن چی دەڵێت.

(٢٦) (موسا رووی کردە خەڵکەکە) وتی: پەروەردگاری من، پەروەردگاری ئێوەش و پەروەردگاری باوو باپیرانی دێرینیشتانە.

(٢٧) فیرعەون (بەگاڵتە پێکردنەوە) وتی: بە راستی (وا دیارە) ئەو پێغەمبەرەی بۆ ئێوە رەوانە کراوە شێتە!!

(٢٨) موسا وتی: پەروەردگاری خۆرهەڵات و خۆرئاواو هەموو ئەو شتانەشە کەوا لەنێوانیاندایە ئەگەر عەقڵ و بیروهۆشتان بخەنەکار!!

(٢٩) فیرعەون سوێندی خوارد و وتی: ئەگەر جگە لە من کەسێکی تر بکەیتە خوای خۆت و فەرمانبەرداری بیت، دەتخەمە ریزی بەندکراوەکانەوە و زیندانیت دەکەم...

(٣٠) موسا وتی: باشە، ئەگەر بەڵگە و شتێکی ئاشکرات پیشان بدەم (لەسەر راستگۆیی خۆم هەر بەندم دەکەیت)...

(٣١) فیرعەون وتی: ئادەی بزانم چیت پێدەکرێت ئەنجامی بدە ئەگەر راست دەکەیت!!...

(٣٢) ئەویش گۆچانەکەی فڕێدا، دەستبەجێ بوو بەهەژدیهایەکی گەورەی ئاشکرا (فیرعەون و دارو دەستەی تۆقان)!!...

(٣٣) دەستیشی (خستە بن باڵی) ودەریهێنا خێرابوو بە(کافوری) سپی و دەدرەوشایەوە لەبەر چاوی تەماشاکاران!!...

(٣٤) فیرعەون (هیچی بۆ نەمایەوە) بەدانیشتوانی دەوروبەری خۆی وت: ئەم (فرستادەیە) جادووگەرێکی زاناو شارەزایە!!...

(٣٥) دەیەوێت لەسەر زەوی خۆتان دەرتان بکات بەهۆی جادوەکەیەوە، فەرمانتان بەچی‌یە؟ (چی بکەین باشە تا سنوورێکی بۆ دابنێین).

(٣٦) دارو دەستەی فیرعەون وتیان: مۆڵەتێک بدە بە موساو براکەی، فەرمانیش بنێرە بۆ کاربەدەستانی هەموو شارەکان تا خەڵکی کۆ بکەنەوە و لە پیلانەکە ئاگاداریان بکەن!!...

(٣٧) بۆ ئەوەی فەرمانبەران هەرچی جادووگەری شارەزا هەیە بۆت بهێنن...

(٣٨) سەرئەنجام جادوگەران لە رۆژی دیاریکراو و کاتێکی دیاریکراوادا کۆکرانەوە...

(٣٩) پاشان بەخەڵکی وترا: ئایا (بۆ دیتنی ئەم دیمەن و شانۆیە) کۆنابنەوە؟!...

لَعَلَّنَا نَتَّبِعُ ٱلسَّحَرَةَ إِن كَانُواْ هُمُ ٱلْغَٰلِبِينَ ﴿٤٠﴾ فَلَمَّا جَآءَ ٱلسَّحَرَةُ قَالُواْ لِفِرْعَوْنَ أَئِنَّ لَنَا لَأَجْرًا إِن كُنَّا نَحْنُ ٱلْغَٰلِبِينَ ﴿٤١﴾ قَالَ نَعَمْ وَإِنَّكُمْ إِذًا لَّمِنَ ٱلْمُقَرَّبِينَ ﴿٤٢﴾ قَالَ لَهُم مُّوسَىٰٓ أَلْقُواْ مَآ أَنتُم مُّلْقُونَ ﴿٤٣﴾ فَأَلْقَوْاْ حِبَالَهُمْ وَعِصِيَّهُمْ وَقَالُواْ بِعِزَّةِ فِرْعَوْنَ إِنَّا لَنَحْنُ ٱلْغَٰلِبُونَ ﴿٤٤﴾ فَأَلْقَىٰ مُوسَىٰ عَصَاهُ فَإِذَا هِىَ تَلْقَفُ مَا يَأْفِكُونَ ﴿٤٥﴾ فَأُلْقِىَ ٱلسَّحَرَةُ سَٰجِدِينَ ﴿٤٦﴾ قَالُوٓاْ ءَامَنَّا بِرَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٤٧﴾ رَبِّ مُوسَىٰ وَهَٰرُونَ ﴿٤٨﴾ قَالَ ءَامَنتُمْ لَهُۥ قَبْلَ أَنْ ءَاذَنَ لَكُمْ إِنَّهُۥ لَكَبِيرُكُمُ ٱلَّذِى عَلَّمَكُمُ ٱلسِّحْرَ فَلَسَوْفَ تَعْلَمُونَ لَأُقَطِّعَنَّ أَيْدِيَكُمْ وَأَرْجُلَكُم مِّنْ خِلَٰفٍ وَلَأُصَلِّبَنَّكُمْ أَجْمَعِينَ ﴿٤٩﴾ قَالُواْ لَا ضَيْرَ إِنَّآ إِلَىٰ رَبِّنَا مُنقَلِبُونَ ﴿٥٠﴾ إِنَّا نَطْمَعُ أَن يَغْفِرَ لَنَا رَبُّنَا خَطَٰيَٰنَآ أَن كُنَّآ أَوَّلَ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴿٥١﴾ ۞ وَأَوْحَيْنَآ إِلَىٰ مُوسَىٰٓ أَنْ أَسْرِ بِعِبَادِىٓ إِنَّكُم مُّتَّبَعُونَ ﴿٥٢﴾ فَأَرْسَلَ فِرْعَوْنُ فِى ٱلْمَدَآئِنِ حَٰشِرِينَ ﴿٥٣﴾ إِنَّ هَٰٓؤُلَآءِ لَشِرْذِمَةٌ قَلِيلُونَ ﴿٥٤﴾ وَإِنَّهُمْ لَنَا لَغَآئِظُونَ ﴿٥٥﴾ وَإِنَّا لَجَمِيعٌ حَٰذِرُونَ ﴿٥٦﴾ فَأَخْرَجْنَٰهُم مِّن جَنَّٰتٍ وَعُيُونٍ ﴿٥٧﴾ وَكُنُوزٍ وَمَقَامٍ كَرِيمٍ ﴿٥٨﴾ كَذَٰلِكَ وَأَوْرَثْنَٰهَا بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ ﴿٥٩﴾ فَأَتْبَعُوهُم مُّشْرِقِينَ ﴿٦٠﴾



(٤٠) بۆ ئەوەی شوێنی جادووگەران بکەوین ئەگەر ئەوان سەرکەوتن و بردیانەوە!...

(٤١) کاتێک جادووگەران هاتن بۆ لای فیرعەون، وتیان: ئایا پاداشتمان دەبێت، ئەگەر ئێمە سەرکەوتین و بردمانەوە؟!

(٤٢) فیرعەون وتی: بەڵێ بێگومان ئێوە لەو کاتەدا سەرەڕای ئەوە لە نزیکانی من دەبن ...

(٤٣) (پاشان لە رۆژو کاتی دیاریکراودا) موسا بە جادووگەرانی وت: چیتان پێیە فڕێی بدەن و چیتان لە دەست دێت درێغی مەکەن؟!

(٤٤) ئەوانیش هەرچی پەت و گوریس و دارو گۆچانیان هەیە فڕێیاندا و وتیان: بەیارمەتی و دەسەڵاتی فیرعەون، بێگومان هەر ئێمە سەردەکەوین و هەر ئێمە دەیبەینەوە.

(٤٥) ئینجا موسا عەساکەی فڕێدا، هەرچی درۆ و دەلەسە و گوریس و داریان هەبوو، هەر هەمووی هەڵلووشی و لەناوی برد.

(٤٦) ئەوسا ئیتر هەموو جادووگەران، خران بە روودا و سوژدەیان برد بۆخوا...

(٤٧) وتیان: ئێمە باوەڕمان هێناوە بە پەروەردگاری جیهانەکان.

(٤٨) پەروەردگاری موساو هاروون.

(٤٩) فیرعەون وتی: هەروا باوەڕتان پێ هێنا پێش ئەوەی مۆڵەتتان بدەم بێگومان ئەم جادووگەرە، گەورەکەتانە، کە فێری جادووگەری کردوون.. خۆتان دەبیننەوە، دەبێت دەست و قاچتان بە پێچەوانەوە بقرتێنم و هەمووتان لە خاچ بدەم.

(٥٠) جادووگەرانی ئەوسا و ئیماندارانی ئێستا، بێ ترس وتیان: هیچ زەرەرو زیانی بۆمان نابێت (لە هەڕەشە ناترسین) چونکە ئێمە دڵنیاین کە بۆ لای پەروەردگارمان دەگەڕێینەوە.

(٥١) ئێمە بەڕاستی بەتەماین و ئومێدەوارین کە پەروەردگارمان لە گوناهەکانمان خۆش ببێت هەر بەوەی یەکەم دەستەین لە ئیمانداران (چاوپۆشی لە رابووردووی ناپەسەندمان دەکات)

(٥٢) (دوای ساڵەها) وەحیمان نارد بۆ موسا (ئیتر وڵات بەجێ بهێڵێت) شەوڕەویی بکە بە بەندەکانم و دڵنیاش بن کە (دوژمنان) شوێنتان دەکەون...

(٥٣) فیرعەون (کە هەواڵی زانی) ناردی بۆ شارەکان کە هێز کۆبکەنەوە و (نەیەڵن نەوەی ئیسرائیل کۆچ بکەن)...

(٥٤) (جاڕی داو وتی) بێگومان ئەوانە دەستەیەکی کەمن و زوو باڵبەستیان دەکەین...

(٥٥) بەڕاستی ئەوانە سەرکەشییان کردووە و ئێمەیان تووڕە کردووە...

(٥٦) (خەمتان نەبێت) بێگومان ئێمە هەموومان بێدارو ئاگادارین (لە نەخشەیان)...

(٥٧) ئینجا ئێمە (بەو شێوەیە فیرعەون و دارو دەستەیمان) دەرهێنا لەناو باخ و باخات و کانیاوەکان...

(٥٨) لە نێو گەنجینەی جۆراو جۆر و جێگە و رێگەی خۆش و رازاوەدا ...

(٥٩) نەوەی ئیسرائیلمان کرد بەخاوەنی (زۆربەی) ماڵ و سامانیان...

(٦٠) ئەوسا (فیرعەون و دارو دەستەی) شوێنیان کەوتن، لەگەڵ خۆرهەڵاتندا پێیان گەیشتن...

فَلَمَّا تَرَٰٓءَا ٱلۡجَمۡعَانِ قَالَ أَصۡحَٰبُ مُوسَىٰٓ إِنَّا لَمُدۡرَكُونَ ﴿٦١﴾ قَالَ كَلَّآۖ إِنَّ مَعِيَ رَبِّي سَيَهۡدِينِ ﴿٦٢﴾ فَأَوۡحَيۡنَآ إِلَىٰ مُوسَىٰٓ أَنِ ٱضۡرِب بِّعَصَاكَ ٱلۡبَحۡرَۖ فَٱنفَلَقَ فَكَانَ كُلُّ فِرۡقٖ كَٱلطَّوۡدِ ٱلۡعَظِيمِ ﴿٦٣﴾ وَأَزۡلَفۡنَا ثَمَّ ٱلۡأٓخَرِينَ ﴿٦٤﴾ وَأَنجَيۡنَا مُوسَىٰ وَمَن مَّعَهُۥٓ أَجۡمَعِينَ ﴿٦٥﴾ ثُمَّ أَغۡرَقۡنَا ٱلۡأٓخَرِينَ ﴿٦٦﴾ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَةٗۖ وَمَا كَانَ أَكۡثَرُهُم مُّؤۡمِنِينَ ﴿٦٧﴾ وَإِنَّ رَبَّكَ لَهُوَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلرَّحِيمُ ﴿٦٨﴾ وَٱتۡلُ عَلَيۡهِمۡ نَبَأَ إِبۡرَٰهِيمَ ﴿٦٩﴾ إِذۡ قَالَ لِأَبِيهِ وَقَوۡمِهِۦ مَا تَعۡبُدُونَ ﴿٧٠﴾ قَالُواْ نَعۡبُدُ أَصۡنَامٗا فَنَظَلُّ لَهَا عَٰكِفِينَ ﴿٧١﴾ قَالَ هَلۡ يَسۡمَعُونَكُمۡ إِذۡ تَدۡعُونَ ﴿٧٢﴾ أَوۡ يَنفَعُونَكُمۡ أَوۡ يَضُرُّونَ ﴿٧٣﴾ قَالُواْ بَلۡ وَجَدۡنَآ ءَابَآءَنَا كَذَٰلِكَ يَفۡعَلُونَ ﴿٧٤﴾ قَالَ أَفَرَءَيۡتُم مَّا كُنتُمۡ تَعۡبُدُونَ ﴿٧٥﴾ أَنتُمۡ وَءَابَآؤُكُمُ ٱلۡأَقۡدَمُونَ ﴿٧٦﴾ فَإِنَّهُمۡ عَدُوّٞ لِّيٓ إِلَّا رَبَّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴿٧٧﴾ ٱلَّذِي خَلَقَنِي فَهُوَ يَهۡدِينِ ﴿٧٨﴾ وَٱلَّذِي هُوَ يُطۡعِمُنِي وَيَسۡقِينِ ﴿٧٩﴾ وَإِذَا مَرِضۡتُ فَهُوَ يَشۡفِينِ ﴿٨٠﴾ وَٱلَّذِي يُمِيتُنِي ثُمَّ يُحۡيِينِ ﴿٨١﴾ وَٱلَّذِيٓ أَطۡمَعُ أَن يَغۡفِرَ لِي خَطِيٓـَٔتِي يَوۡمَ ٱلدِّينِ ﴿٨٢﴾ رَبِّ هَبۡ لِي حُكۡمٗا وَأَلۡحِقۡنِي بِٱلصَّٰلِحِينَ ﴿٨٣﴾

کاتێک هەردوولا یەکتریان بەدی کرد، یارانی موسا وتیان: بەڕاستی پێمانگەیشتن و ئێمە تیاچووین.

موسا وتی: نەخێر، وانیە، من بەڕاستی پەروەردگارم لەگەڵدایە و ڕێنموویم دەکات (بۆ رزگاری و سەرفرازی).

ئەوسا ئێمە وەحیمان نارد بۆ موسا کە: بە عەساکەت بماڵە بەدەریاکەدا، (هەر کە ئەو کارەی کرد) دەریا شەق بوو و هەر ڕێگە و شەقامێکی دەورە درا بەشەپۆلی گەورەی ئاو، کە وەک کێوێکی گەورە و مەزن وابوو! ئاوەکە هەڵدرایەوە دوانزە کوڵانی بۆ دوانزە تایەفەکەی نەوەی ئیسرائیل دروست کردو بەنێوانیاندا پەڕینەوە)...

پاشان ئەوانی ترمان لەو شوێنە نزیک کردەوە...

موسا و هەموو ئەوانەش لەگەڵیدا بوون رزگارمان کردن...

پاشان ئەوانی ترمان نوقمی دەریا کرد.

تەماشای ئایەتی ٨، ٩ بکە.

هەروەها بەسەرهات و هەواڵی ئیبراهیم بۆ ئەو خەڵکە باس بکە.

کاتێک بە باوکی و بە قەومەکەی وت: باشە، ئەوە ئێوە چی دەپەرستن؟!

وتیان: (ئاشکرایە) ئێمە کۆمەڵێ بت دەپەرستین و بەردەوام دەورو خولیان دەدەین.

ئیبراهیم وتی: ئایا کاتێک کە هاناو هاواریان بۆ دەبەن و دوعا و نزا دەکەن، گوێیان لە ئاهـ و ناڵە و داخوازیەکانتان هەیە؟!..

یاخود دەتوانن ئەوانە قازانجێک یان زیانێکتان پێبگەیەنن؟ ...

بت پەرستان وتیان: (ئێمە ئەوە نازانین) باو و باپیرانمان بینیووە ئاوایان کردووە (ئێمەش وا دەکەین)...

ئیبراهیم وتی: باشە ئاخر ئێوە نابینن چی دەپەرستن (کەی ئەو شتانە شایستەی پەرستنن)...

بەڕاستی ئێوەش و باو و باپیرانی دێرینیشتان (بە هەڵەدا چوون)...

بێگومان هەموو ئەوانە دوژمنی منن، بە دوژمنی خۆمیان دەزانم جگە لە پەروەردگاری جیهانەکان ...

ئەوەی دروستی کردووم هەر ئەو ڕێنموییم دەکات (بۆ بەختەوەری هەردوو جیهان)...

ئەو زاتەش خۆی خۆراکم پێ دەبەخشێت و تینویەتیم دەشکێنێت...

کاتێکیش کە نەخۆش دەکەوم، ئەوە هەر ئەو چارەسەرم دەکات و شیفام بۆ دەنێرێت...

هەر ئەویش دەممرێنێت و لەوەودواش زیندووم دەکاتەوە...

هەر ئەوە ئومێدم پێیەتی کە لە گوناهم خۆش ببێت لە ڕۆژی قیامەتدا ...

(ئینجا ئیبراهیم نزای کردو وتی) پەروەردگارا: زانیاری و دانایی و دەسەڵاتی تەواوم پێ ببەخشە و پەیوەستم بکە بە چاکەکارانەوە.

وَٱجْعَل لِّي لِسَانَ صِدْقٍ فِي ٱلْآخِرِينَ ﴿٨٤﴾ وَٱجْعَلْنِي مِن وَرَثَةِ جَنَّةِ ٱلنَّعِيمِ ﴿٨٥﴾ وَٱغْفِرْ لِأَبِيٓ إِنَّهُۥ كَانَ مِنَ ٱلضَّآلِّينَ ﴿٨٦﴾ وَلَا تُخْزِنِي يَوْمَ يُبْعَثُونَ ﴿٨٧﴾ يَوْمَ لَا يَنفَعُ مَالٌ وَلَا بَنُونَ ﴿٨٨﴾ إِلَّا مَنْ أَتَى ٱللَّهَ بِقَلْبٍ سَلِيمٍ ﴿٨٩﴾ وَأُزْلِفَتِ ٱلْجَنَّةُ لِلْمُتَّقِينَ ﴿٩٠﴾ وَبُرِّزَتِ ٱلْجَحِيمُ لِلْغَاوِينَ ﴿٩١﴾ وَقِيلَ لَهُمْ أَيْنَ مَا كُنتُمْ تَعْبُدُونَ ﴿٩٢﴾ مِن دُونِ ٱللَّهِ هَلْ يَنصُرُونَكُمْ أَوْ يَنتَصِرُونَ ﴿٩٣﴾ فَكُبْكِبُوا۟ فِيهَا هُمْ وَٱلْغَاوُۥنَ ﴿٩٤﴾ وَجُنُودُ إِبْلِيسَ أَجْمَعُونَ ﴿٩٥﴾ قَالُوا۟ وَهُمْ فِيهَا يَخْتَصِمُونَ ﴿٩٦﴾ تَٱللَّهِ إِن كُنَّا لَفِي ضَلَٰلٍ مُّبِينٍ ﴿٩٧﴾ إِذْ نُسَوِّيكُم بِرَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٩٨﴾ وَمَآ أَضَلَّنَآ إِلَّا ٱلْمُجْرِمُونَ ﴿٩٩﴾ فَمَا لَنَا مِن شَٰفِعِينَ ﴿١٠٠﴾ وَلَا صَدِيقٍ حَمِيمٍ ﴿١٠١﴾ فَلَوْ أَنَّ لَنَا كَرَّةً فَنَكُونَ مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴿١٠٢﴾ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَءَايَةً وَمَا كَانَ أَكْثَرُهُم مُّؤْمِنِينَ ﴿١٠٣﴾ وَإِنَّ رَبَّكَ لَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلرَّحِيمُ ﴿١٠٤﴾ كَذَّبَتْ قَوْمُ نُوحٍ ٱلْمُرْسَلِينَ ﴿١٠٥﴾ إِذْ قَالَ لَهُمْ أَخُوهُمْ نُوحٌ أَلَا تَتَّقُونَ ﴿١٠٦﴾ إِنِّي لَكُمْ رَسُولٌ أَمِينٌ ﴿١٠٧﴾ فَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَأَطِيعُونِ ﴿١٠٨﴾ وَمَآ أَسْـَٔلُكُمْ عَلَيْهِ مِنْ أَجْرٍ إِنْ أَجْرِيَ إِلَّا عَلَىٰ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿١٠٩﴾ فَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَأَطِيعُونِ ﴿١١٠﴾ ۞ قَالُوٓا۟ أَنُؤْمِنُ لَكَ وَٱتَّبَعَكَ ٱلْأَرْذَلُونَ ﴿١١١﴾




پەروەردگارا: یادی خێرم با لەسەر زاری نەوەکانی داهاتوو بمێنێت.

بمگێڕە لەو کەسانەش کە بەهەشتی پڕ لە نازو نیعمەت بەدەست دەهێنن و دەبنە خاوەنی.

لە باوکیشم خۆش ببە بەڕاستی ئەو لە ریزی گومڕاکاندا بوو (دیارە هێشتا لێی نائومێد نەبووە)

لە رۆژی زیندوو بوونەوەی ئەو خەڵکەدا شەرمەزار و خەجاڵەتم مەکە.

ئەو رۆژەی کە نە ماڵ سوود دەبەخشێت و (فریای نادەمیزاد دەکەوێت) نە منداڵ و نەوە.

مەگەر کەسێک بە دڵ و دەروونی پاک و بێگەردو پڕ لە ئیمان، بە خزمەت پەروەردگار گەشتبێت.

ئەوکاتە، بەهەشت لە چاکەکاران و خواناسان نزیک کراوەتەوە.

دۆزەخیش بۆ گومڕاو سەرلێشێواوەکان دەرخراوە...

پێشیان دەوترێ: لە کوێن ئەوانەی دەتانپەرست؟...

لە جیاتی خوا، ئایا یارمەتی ئێوەیان پێ دەدرێت یان فریای خۆیان دەکەون؟

ئینجا هەموویان بە پاڵەپەستۆو توندو تیژییەوە، بتەکان و گومڕاکان بەسەر روودا فڕێ دەدرێنە ناو ئاگری دۆزەخەوە...

(هاوڕێ لەگەڵ) هەر هەموو سەربازان و دەست و پێوەندی شەیتاندا .

(بت پەرستان: بەبتەکان و پەرستراوەکانیان) دەڵێن: بە رق و کینەوە، لەکاتێکدا کە ئاژاوە و کێشە دەگێڕن لە دۆزەخدا...

سوێند بە خوا بەڕاستی ئێمە لەگومڕاییەکی ئاشکرادا دەژیاین...

کاتێک کە ئێوەمان دەبردە ریزی پەروەردگاری جیهانیانەوە و یەکسانمان دەکردن لەگەڵیدا...

ئێمە کەس گومڕای نەکردین تەنها گوناهکارو تاوانبارەکان نەبێت ...

کەواتە ئێمە هیچ تکاکارێکمان بۆ نییە...

یاخود هاوڕێیەکی دڵسۆز هەوڵێکمان بۆ بدات، یان دڵخۆشیمان بداتەوە...

جا خۆزگە جارێکی تر مۆڵەتمان بدرایە و (بگەڕاینەوە بۆ دنیا) و بەهۆی ئەوەوە بچینە ریزی ئیماندارانەوە.

، (١٠٤) سەرنجی ئایەتی ٨ ـ ٩ بدە.

قەومی ـ نوح ـ یش بەرنامەی هەر هەموو پێغەمبەرانیان بەدرۆ زانی.

کاتێک ـ نوح ـ ی برایان پێی وتن: باشە، ئەوە ئێوە لە خوا ناترسن، پارێزکار نابن؟!

بەڕاستی دڵنیابن کە من فرستادەیەکی ئەمین و دڵسۆزم بۆتان...

کەوابوو لە خوا بترسن و فەرمانبەرداری من بکەن...

من داوای هیچ جۆرە پاداشتێکتان لێ ناکەم لەسەری، من تەنها پاداشتی خۆم لە پەروەردگاری جیهانەکان دەخوازم.

هەمیشە لە خوا بترسن و فەرمانبەرداری من بن...

(هەندێک لە دەمدارانی قەومەکەی) وتیان: ئێمە چۆن باوەڕ لەبەر خاتری تۆ بهێنین، لەکاتێکدا کە کەسانی هەژارو داماو شوێنت کەوتووز!

قَالَ وَمَا عِلْمِي بِمَا كَانُوا يَعْمَلُونَ ﴿١١٢﴾ إِنْ حِسَابُهُمْ إِلَّا عَلَىٰ رَبِّي لَوْ تَشْعُرُونَ ﴿١١٣﴾ وَمَا أَنَا بِطَارِدِ الْمُؤْمِنِينَ ﴿١١٤﴾ إِنْ أَنَا إِلَّا نَذِيرٌ مُّبِينٌ ﴿١١٥﴾ قَالُوا لَئِن لَّمْ تَنتَهِ يَا نُوحُ لَتَكُونَنَّ مِنَ الْمَرْجُومِينَ ﴿١١٦﴾ قَالَ رَبِّ إِنَّ قَوْمِي كَذَّبُونِ ﴿١١٧﴾ فَافْتَحْ بَيْنِي وَبَيْنَهُمْ فَتْحًا وَنَجِّنِي وَمَن مَّعِيَ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ ﴿١١٨﴾ فَأَنجَيْنَاهُ وَمَن مَّعَهُ فِي الْفُلْكِ الْمَشْحُونِ ﴿١١٩﴾ ثُمَّ أَغْرَقْنَا بَعْدُ الْبَاقِينَ ﴿١٢٠﴾ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَةً ۖ وَمَا كَانَ أَكْثَرُهُم مُّؤْمِنِينَ ﴿١٢١﴾ وَإِنَّ رَبَّكَ لَهُوَ الْعَزِيزُ الرَّحِيمُ ﴿١٢٢﴾ كَذَّبَتْ عَادٌ الْمُرْسَلِينَ ﴿١٢٣﴾ إِذْ قَالَ لَهُمْ أَخُوهُمْ هُودٌ أَلَا تَتَّقُونَ ﴿١٢٤﴾ إِنِّي لَكُمْ رَسُولٌ أَمِينٌ ﴿١٢٥﴾ فَاتَّقُوا اللَّهَ وَأَطِيعُونِ ﴿١٢٦﴾ وَمَا أَسْأَلُكُمْ عَلَيْهِ مِنْ أَجْرٍ ۖ إِنْ أَجْرِيَ إِلَّا عَلَىٰ رَبِّ الْعَالَمِينَ ﴿١٢٧﴾ أَتَبْنُونَ بِكُلِّ رِيعٍ آيَةً تَعْبَثُونَ ﴿١٢٨﴾ وَتَتَّخِذُونَ مَصَانِعَ لَعَلَّكُمْ تَخْلُدُونَ ﴿١٢٩﴾ وَإِذَا بَطَشْتُم بَطَشْتُمْ جَبَّارِينَ ﴿١٣٠﴾ فَاتَّقُوا اللَّهَ وَأَطِيعُونِ ﴿١٣١﴾ وَاتَّقُوا الَّذِي أَمَدَّكُم بِمَا تَعْلَمُونَ ﴿١٣٢﴾ أَمَدَّكُم بِأَنْعَامٍ وَبَنِينَ ﴿١٣٣﴾ وَجَنَّاتٍ وَعُيُونٍ ﴿١٣٤﴾ إِنِّي أَخَافُ عَلَيْكُمْ عَذَابَ يَوْمٍ عَظِيمٍ ﴿١٣٥﴾ قَالُوا سَوَاءٌ عَلَيْنَا أَوَعَظْتَ أَمْ لَمْ تَكُن مِّنَ الْوَاعِظِينَ ﴿١٣٦﴾

نوح وتی: جا من چوزانم، ئه‌وان چ کارو کرده‌وه‌یه‌کیان ئه‌نجامده‌دا (من بانگم کردن بۆ ئیمان و بروایان هێناوه).
حساب و پرسینه‌وه‌یان ته‌نها له‌سه‌ر په‌روه‌ردگاری منه‌و له‌سه‌ر که‌سی تر نی‌یه، ئه‌گه‌ر هه‌ست و هوشیاریتان هه‌یه...
من هه‌رگیز ئیماندااران ده‌رناکه‌م و (دڵیان نائێشێنم)...
به‌ڵکو من ته‌نها بێدارکه‌ره‌وه‌یه‌کی ئاشکرا نه‌بێت هیچی تر نیم...
(ئه‌وسا ده‌سه‌ڵاتداران) وتیان: ئه‌ی نوح ئه‌گه‌ر کۆڵ نه‌ده‌یت و کۆتایی به‌م باسانه نه‌هێنیت، به‌ڕاستی له ره‌جم کراوان ده‌بیت و (به‌رد بارانت ده‌که‌ین).
(نوح سکاڵای کردو) وتی: په‌روه‌ردگارا به‌ڕاستی قه‌ومه‌که‌م بڕوایان پێنه‌کردم.
که‌واته داواکارم سه‌رکه‌وتنم پێببه‌خشیت به‌سه‌ریاندا و ده‌روم لێ بکه‌یته‌وه و خۆم و ئیماندارانی یاوه‌ریشم رزگار بکه‌یت.
(ئه‌وسا ئێمه) خۆی و هه‌رچی له‌گه‌ڵیدا بوون رزگارمان کرد له که‌شتیه بارهه‌ڵگره‌که‌دا.
پاشان دوای ئه‌وان هه‌رچی مایه‌وه (له خه‌لکه گومراکه) نوقمی ئاوی زریانه‌که‌مان کرد.
سه‌رنجی ئایه‌تی ٨ - ٩ بده‌.
قه‌ومی عادیش به‌رنامه‌ی هه‌ر هه‌موو پێغه‌مبه‌رانیان به‌درۆزانی.
کاتێک (هود)ی پێغه‌مبه‌ری برایان پێی وتن: باشه، ئه‌وه ئێوه له خوا ناترسن، پارێزکار نابن.
به‌ڕاستی دڵنیابن که من فرستاده‌یه‌کی ئه‌مین و دڵسۆزم بۆتان.
له خوا بترسن و فه‌رمانبه‌ردارم بن...
سه‌رنجی ئایه‌تی ١٠٩ بده...
ئایا ئێوه له هه‌موو شوێنێکی بڵند و سازگاردا کۆشک و ته‌لار دروست ده‌که‌ن و خۆتان سه‌رگه‌رمی که‌یف و شادی ده‌که‌ن؟! (ئایا بۆ ئه‌وه دروست کراون؟)...
هه‌ر خه‌ریکی دروستکردنی کارگه‌و کارخانه‌ن و به‌ئومێدی ئه‌وه‌ن هه‌میشه بژین و نه‌مرن...
کاتێک په‌لامار ده‌ده‌ن، به‌شێوه‌یه‌کی زۆر دڵ ره‌ق و درندانه په‌لامار ده‌ده‌ن ده‌ست ده‌وه‌شێنن!...
که‌واته له خوا بترسن و فه‌رمانبه‌ردارم بن...
له‌و زاته بترسن که خۆتان ده‌زانن چی پێبه‌خشیوون...
ماڵاتی زۆرو نه‌وه‌ی زۆری پێبه‌خشیوون...
هه‌روه‌ها باخچه و باخات و کانی و سه‌رچاوه‌ی زۆر...
به‌ڕاستی من ده‌ترسم له رۆژێکی زۆر سه‌ختدا به‌ڵایه‌کی گه‌وره یه‌خه‌تان پێ بگرێت...
(سته‌مکاران) وتیان: چوونیه‌که به‌لای ئێمه‌وه ئامۆژگاری کردبێت یان نه‌تکردبێت؟!...

إِنْ هَٰذَآ إِلَّا خُلُقُ ٱلْأَوَّلِينَ ﴿١٣٧﴾ وَمَا نَحْنُ بِمُعَذَّبِينَ ﴿١٣٨﴾ فَكَذَّبُوهُ فَأَهْلَكْنَٰهُمْ ۗ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَةً ۖ وَمَا كَانَ أَكْثَرُهُم مُّؤْمِنِينَ ﴿١٣٩﴾ وَإِنَّ رَبَّكَ لَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلرَّحِيمُ ﴿١٤٠﴾ كَذَّبَتْ ثَمُودُ ٱلْمُرْسَلِينَ ﴿١٤١﴾ إِذْ قَالَ لَهُمْ أَخُوهُمْ صَٰلِحٌ أَلَا تَتَّقُونَ ﴿١٤٢﴾ إِنِّى لَكُمْ رَسُولٌ أَمِينٌ ﴿١٤٣﴾ فَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَأَطِيعُونِ ﴿١٤٤﴾ وَمَآ أَسْـَٔلُكُمْ عَلَيْهِ مِنْ أَجْرٍ ۖ إِنْ أَجْرِىَ إِلَّا عَلَىٰ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿١٤٥﴾ أَتُتْرَكُونَ فِى مَا هَٰهُنَآ ءَامِنِينَ ﴿١٤٦﴾ فِى جَنَّٰتٍ وَعُيُونٍ ﴿١٤٧﴾ وَزُرُوعٍ وَنَخْلٍ طَلْعُهَا هَضِيمٌ ﴿١٤٨﴾ وَتَنْحِتُونَ مِنَ ٱلْجِبَالِ بُيُوتًا فَٰرِهِينَ ﴿١٤٩﴾ فَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَأَطِيعُونِ ﴿١٥٠﴾ وَلَا تُطِيعُوٓا۟ أَمْرَ ٱلْمُسْرِفِينَ ﴿١٥١﴾ ٱلَّذِينَ يُفْسِدُونَ فِى ٱلْأَرْضِ وَلَا يُصْلِحُونَ ﴿١٥٢﴾ قَالُوٓا۟ إِنَّمَآ أَنتَ مِنَ ٱلْمُسَحَّرِينَ ﴿١٥٣﴾ مَآ أَنتَ إِلَّا بَشَرٌ مِّثْلُنَا فَأْتِ بِـَٔايَةٍ إِن كُنتَ مِنَ ٱلصَّٰدِقِينَ ﴿١٥٤﴾ قَالَ هَٰذِهِۦ نَاقَةٌ لَّهَا شِرْبٌ وَلَكُمْ شِرْبُ يَوْمٍ مَّعْلُومٍ ﴿١٥٥﴾ وَلَا تَمَسُّوهَا بِسُوٓءٍ فَيَأْخُذَكُمْ عَذَابُ يَوْمٍ عَظِيمٍ ﴿١٥٦﴾ فَعَقَرُوهَا فَأَصْبَحُوا۟ نَٰدِمِينَ ﴿١٥٧﴾ فَأَخَذَهُمُ ٱلْعَذَابُ ۗ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَةً ۖ وَمَا كَانَ أَكْثَرُهُم مُّؤْمِنِينَ ﴿١٥٨﴾ وَإِنَّ رَبَّكَ لَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلرَّحِيمُ ﴿١٥٩﴾

ئه‌م بیرو باوه‌ڕه‌ی ئێمه هه‌مانه ڕه‌وشتی پێشینانمانه‌و هیچی تر.

(ئێمه بڕوا ناکه‌ین که وه‌ک تۆ ده‌ڵێیت) له سزادراوان و ئازاردراوان بین.

ئه‌وان بڕوایان پێنه‌کرد، ئێمه‌ش له‌ناومان بردن، به‌ڕاستی له به‌سه‌رهاتیاندا به‌ڵگه و نیشانه و عیبره‌ت هه‌یه، هه‌رچه‌نده زۆربه‌شیان باوه‌ڕدار نه‌بوون.

به‌ڕاستی په‌روه‌ردگاری تۆ (ئه‌ی محمد ، ئه‌ی ئیماندار) بالاده‌سته (به‌سه‌ر بێ باوه‌ڕاندا)و به‌سۆزو میهره‌بانه (به ئیمانداران).

قه‌ومی (ثه‌مود) یش بڕوایان به پێغه‌مبه‌رانیان نه‌کرد.

کاتێک صالحی برایان پێی وتن: باشه، ئه‌وه ئێوه له خوا ناترسن، پارێزکار نابن؟

سه‌رنجی ئایه‌تی ١٠٧ بده.

له ١٠٨دا ماناکراوه.

له ١٠٩دا ماناکراوه.

ئایا واده‌زانن هه‌روا ئالێره‌دا به‌خۆشی و ئاسووده‌یی ده‌هێلرێنه‌وه (ژیانتان کۆتایی نایه‌ت)؟

له‌ناو باخ و باخات و کانیاوی سازگاردا؟!!

له‌ناو بێستان و دارخورمادا که خورمای نه‌رم و ناسک و به‌تام ده‌گرێت؟!!

(هه‌روه‌ها بۆتان ده‌لوێت) ماڵ و شوێنی خۆش له چیاکان دابتاشن و به‌جوانی دروستی بکه‌ن‌و به‌خۆشی تیایدا که‌شخه بکه‌ن؟!

له خوا بترسن و فه‌رمانبه‌رداری من بکه‌ن.

به فه‌رمانی موسریف و له سنوور ده‌رچووه‌کان هه‌ڵس و که‌وت مه‌که‌ن...

ئه‌وانه‌ی که تۆوی فه‌سادو تاوان له زه‌ویدا ده‌چێنن و هه‌رگیز چاکسازی ناکه‌ن.

خوانه‌ناسان وتیان: وادیاره تۆ به‌ڕاستی له‌وانه‌ی که فێڵ و جادووت لێکراوه!!

تۆ جگه له‌وه‌ی که هه‌ر به‌شه‌رێکی وه‌کو ئێمه، هیچی تر نیت، به‌ڵگه‌یه‌کمان نیشان بده ئه‌گه‌ر له ڕاستگۆیانیت؟!

(جا خوای به توانا حوشترێکی بۆ به‌دیهێنان، تا ده‌مکوتیان بکات و بیانویان ببڕێت)، ئینجا - صالح - پێغه‌مبه‌ر پێی وتن: ئه‌مه وشترێکه و موعجیزه‌یه‌که ده‌بێت ڕۆژێک ئاو ته‌نها بۆ ئه‌م بێت، ڕۆژێکیش بۆ ئێوه، دیاریکراو بێت.

نه‌که‌ن ده‌ستدرێژی بکه‌نه سه‌رو ئازاری بده‌ن، به‌هۆی ئه‌وه‌وه سزایه‌کی سه‌خت له ڕۆژێکی سامناکدا یه‌خه‌تان نه‌گرێت.

(به‌لام گوێیان نه‌دا به‌ئامۆژگاریه‌کانی صالح)، جا سه‌ریان بڕی و ده‌ستبه‌جێ له‌به‌یانیدا په‌شیمان بوونه‌وه...

ئه‌وسا به‌هۆی ئه‌وه‌وه خێرا سزای خوایی یه‌خه‌ی گرتن، به‌ڕاستی ئا له‌وه‌دا به‌ڵگه و نیشانه هه‌یه (له‌سه‌ر تۆڵه‌ی خوایی) هه‌رچه‌نده زۆربه‌شیان باوه‌ڕدار نه‌بوون.

سه‌رنجی ئایه‌تی ٩ بده.

كَذَّبَتْ قَوْمُ لُوطٍ ٱلْمُرْسَلِينَ ﴿١٦٠﴾ إِذْ قَالَ لَهُمْ أَخُوهُمْ لُوطٌ أَلَا تَتَّقُونَ ﴿١٦١﴾ إِنِّى لَكُمْ رَسُولٌ أَمِينٌ ﴿١٦٢﴾ فَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَأَطِيعُونِ ﴿١٦٣﴾ وَمَآ أَسْـَٔلُكُمْ عَلَيْهِ مِنْ أَجْرٍ ۖ إِنْ أَجْرِىَ إِلَّا عَلَىٰ رَبِّ ٱلْعَـٰلَمِينَ ﴿١٦٤﴾ أَتَأْتُونَ ٱلذُّكْرَانَ مِنَ ٱلْعَـٰلَمِينَ ﴿١٦٥﴾ وَتَذَرُونَ مَا خَلَقَ لَكُمْ رَبُّكُم مِّنْ أَزْوَٰجِكُم ۚ بَلْ أَنتُمْ قَوْمٌ عَادُونَ ﴿١٦٦﴾ قَالُوا۟ لَئِن لَّمْ تَنتَهِ يَـٰلُوطُ لَتَكُونَنَّ مِنَ ٱلْمُخْرَجِينَ ﴿١٦٧﴾ قَالَ إِنِّى لِعَمَلِكُم مِّنَ ٱلْقَالِينَ ﴿١٦٨﴾ رَبِّ نَجِّنِى وَأَهْلِى مِمَّا يَعْمَلُونَ ﴿١٦٩﴾ فَنَجَّيْنَـٰهُ وَأَهْلَهُۥٓ أَجْمَعِينَ ﴿١٧٠﴾ إِلَّا عَجُوزًا فِى ٱلْغَـٰبِرِينَ ﴿١٧١﴾ ثُمَّ دَمَّرْنَا ٱلْـَٔاخَرِينَ ﴿١٧٢﴾ وَأَمْطَرْنَا عَلَيْهِم مَّطَرًا ۖ فَسَآءَ مَطَرُ ٱلْمُنذَرِينَ ﴿١٧٣﴾ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَـَٔايَةً ۖ وَمَا كَانَ أَكْثَرُهُم مُّؤْمِنِينَ ﴿١٧٤﴾ وَإِنَّ رَبَّكَ لَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلرَّحِيمُ ﴿١٧٥﴾ كَذَّبَ أَصْحَـٰبُ لْـَٔيْكَةِ ٱلْمُرْسَلِينَ ﴿١٧٦﴾ إِذْ قَالَ لَهُمْ شُعَيْبٌ أَلَا تَتَّقُونَ ﴿١٧٧﴾ إِنِّى لَكُمْ رَسُولٌ أَمِينٌ ﴿١٧٨﴾ فَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَأَطِيعُونِ ﴿١٧٩﴾ وَمَآ أَسْـَٔلُكُمْ عَلَيْهِ مِنْ أَجْرٍ ۖ إِنْ أَجْرِىَ إِلَّا عَلَىٰ رَبِّ ٱلْعَـٰلَمِينَ ﴿١٨٠﴾ ۞ أَوْفُوا۟ ٱلْكَيْلَ وَلَا تَكُونُوا۟ مِنَ ٱلْمُخْسِرِينَ ﴿١٨١﴾ وَزِنُوا۟ بِٱلْقِسْطَاسِ ٱلْمُسْتَقِيمِ ﴿١٨٢﴾ وَلَا تَبْخَسُوا۟ ٱلنَّاسَ أَشْيَآءَهُمْ وَلَا تَعْثَوْا۟ فِى ٱلْأَرْضِ مُفْسِدِينَ ﴿١٨٣﴾



قەومی لوطیش بڕوایان بە پێغەمبەران نەکرد ...

کاتێک (لوط) ی برایان پێی وتن: باشە، ئەوە ئێوە لە خوا ناترسن.

ئایەتەکانی لە ۱۰۷، ۱۰۸، ۱۰۹ دا مانا کراوە.

ئایا لەناو ئەو هەموو خەڵکەدا ئێوە بە شوێن نێرینەدا دەگەڕێن و دەتانەوێت ئارەزووی جووت بوون لەگەڵ ئەواندا جێبەجێ بکەن؟...

وازیش دەهێنن لە هاوسەران و هاوجووتانی خۆتان کە پەروەردگارتان بۆی دروست کردوون، بەڵکو ئێوە هەر قەومێکی نالەبارو بەدڕەوشت و نارەسەنن.

تاوانباران وتیان: ئەی لوط، ئەگەر کۆڵ نەدەیت لە دەربەدەر کراوان دەبیت.

لوط وتی: بەڕاستی من بێزارم لە کارو کردەوەتان و نەفرەتی لێدەکەم و بێدەنگ نابم.

ئەوسا کە نائومێد بوو لێیان، نزای کردو وتی: پەروەردگارا خۆم و ماڵ و خێزانم رزگار بکە لەو کاروکردەوانەی ئەمانە دەیکەن.

جا ئێمەش نزامان گیراکرد و خۆی و ماڵ و خێزانیمان هەمووی رزگارکرد ...

جگە لە پیرەژنێک (کە هاوسەری بوو) لە تیاچووەکان بوو(چونکە باوەڕی بە پەیامەکەی نەبوو).

لەوەودوا ئەوانی ترمان ریشەکەن کرد.

بەسەختیش بەرد بارانمان کردن، ئای کە خراپ و سەخت و دژوارە بارانی بێدارکراوەکان.

سەرنجی ئایەتی ۸، ۹ بدە.

خاوەنی باخ و باخاتە چڕو پڕەکانیش بەرنامەی گشت پێغەمبەرانیان بەدرۆزانی.

کاتێک شوعەیب پێغەمبەر پێی وتن: باشە، ئەوە ئێوە لە خوا ناترسن، پارێزکار نابن؟

سەرنجی ئایەتی ۱۰۷ بدە. سەرنجی ئایەتی ۱۰۸ بدە. (۱۸۰) سەرنجی ئایەتی ۱۰۹ بدە.

لە کێشان و پێواندا وەفاداربن و فێڵ مەکەن و لەو کەسانە مەبن کە زەرەر بەخەڵکی دەگەیەنن و شتیان بێ نرخ دەکەن و (هەربەرژەوەندی خۆیانیان دەوێت).

بە تەرازوو پێوەری راست و دروستیش کێشانە و پێوانە بکەن.

نرخی کەلوپەل و شتومەکی خەڵکی مەشکێنن و سووکی مەکەن و لە زەویدا فەساد و تاوان نەنجام مەدەن.

وَٱتَّقُواْ ٱلَّذِي خَلَقَكُمْ وَٱلْجِبِلَّةَ ٱلْأَوَّلِينَ ﴿١٨٤﴾ قَالُوٓاْ إِنَّمَآ أَنتَ مِنَ ٱلْمُسَحَّرِينَ ﴿١٨٥﴾ وَمَآ أَنتَ إِلَّا بَشَرٌ مِّثْلُنَا وَإِن نَّظُنُّكَ لَمِنَ ٱلْكَٰذِبِينَ ﴿١٨٦﴾ فَأَسْقِطْ عَلَيْنَا كِسَفًا مِّنَ ٱلسَّمَآءِ إِن كُنتَ مِنَ ٱلصَّٰدِقِينَ ﴿١٨٧﴾ قَالَ رَبِّيٓ أَعْلَمُ بِمَا تَعْمَلُونَ ﴿١٨٨﴾ فَكَذَّبُوهُ فَأَخَذَهُمْ عَذَابُ يَوْمِ ٱلظُّلَّةِ ۚ إِنَّهُۥ كَانَ عَذَابَ يَوْمٍ عَظِيمٍ ﴿١٨٩﴾ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَءَايَةً ۖ وَمَا كَانَ أَكْثَرُهُم مُّؤْمِنِينَ ﴿١٩٠﴾ وَإِنَّ رَبَّكَ لَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلرَّحِيمُ ﴿١٩١﴾ وَإِنَّهُۥ لَتَنزِيلُ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿١٩٢﴾ نَزَلَ بِهِ ٱلرُّوحُ ٱلْأَمِينُ ﴿١٩٣﴾ عَلَىٰ قَلْبِكَ لِتَكُونَ مِنَ ٱلْمُنذِرِينَ ﴿١٩٤﴾ بِلِسَانٍ عَرَبِيٍّ مُّبِينٍ ﴿١٩٥﴾ وَإِنَّهُۥ لَفِي زُبُرِ ٱلْأَوَّلِينَ ﴿١٩٦﴾ أَوَلَمْ يَكُن لَّهُمْ ءَايَةً أَن يَعْلَمَهُۥ عُلَمَٰٓؤُاْ بَنِيٓ إِسْرَٰٓءِيلَ ﴿١٩٧﴾ وَلَوْ نَزَّلْنَٰهُ عَلَىٰ بَعْضِ ٱلْأَعْجَمِينَ ﴿١٩٨﴾ فَقَرَأَهُۥ عَلَيْهِم مَّا كَانُواْ بِهِۦ مُؤْمِنِينَ ﴿١٩٩﴾ كَذَٰلِكَ سَلَكْنَٰهُ فِي قُلُوبِ ٱلْمُجْرِمِينَ ﴿٢٠٠﴾ لَا يُؤْمِنُونَ بِهِۦ حَتَّىٰ يَرَوُاْ ٱلْعَذَابَ ٱلْأَلِيمَ ﴿٢٠١﴾ فَيَأْتِيَهُم بَغْتَةً وَهُمْ لَا يَشْعُرُونَ ﴿٢٠٢﴾ فَيَقُولُواْ هَلْ نَحْنُ مُنظَرُونَ ﴿٢٠٣﴾ أَفَبِعَذَابِنَا يَسْتَعْجِلُونَ ﴿٢٠٤﴾ أَفَرَءَيْتَ إِن مَّتَّعْنَٰهُمْ سِنِينَ ﴿٢٠٥﴾ ثُمَّ جَآءَهُم مَّا كَانُواْ يُوعَدُونَ ﴿٢٠٦﴾

(١٨٤) هەر لەو زاتە بترسن کە ئێوەش و نەوەکانی پێش ئێوەشی دروست کردووە.

(١٨٥) (نەفامان) وتیان: بەڕاستی تۆ نەوەی شوعەیب هەر لە جادوو لێکراوانیت.

(١٨٦) تۆ تەنها مرۆڤێکی وەکو ئێمەیت و هیچی تر، بەڕاستی واگومان دەبەین کەلە درۆزنان بیت!!

(١٨٧) دە پارچەیەک لە ئاسمانەوە بەسەرماندا دابارێنە ئەگەر تۆ لە ریزی راستگۆیاندایت؟!

(١٨٨) شوعەیب وتی: من دڵنیام کە پەروەردگارم ئاگادارە بەوەی کە دەیکەن.

(١٨٩) سەرئەنجام، قەومی نالەبار بڕوایان بە شوعەیب نەکرد، ئیتر سزای رۆژی هەورو سێبەر (کە لە ژێریدا ئاگر باران کران) دایگرتن، بەڕاستی ئەو سزایە سزای رۆژێکی گەورە و سەخت بوو.

(١٩٠)، (١٩١) سەرنجی ئایەتی ٨ ، ٩ بدە.

(١٩٢) بەڕاستی ئەم قورئانە لەلایەن پەروەردگاری هەموو جیهانەکانەوە رەوانەکراوە.

(١٩٣) جوبرەئیلی ئەمین (فریشتەی وەحی) دایبەزاندووە.

(١٩٤) بۆ سەر دڵی تۆ ئەی محمد ﷺ تا بچیتە ریزی ئەو کەسانەوە کە خەڵکی بێدار دەکەنەوە و لە خەوی غەفڵەت دایاندەچڵەکێنن.

(١٩٥) بە زمانی عەرەبی روون و ئاشکرا، یاخود بە زمانێکی پاراو و شیرین و روون.

(١٩٦) بێگومان هەواڵی راستی و دروستی ئەم قورئانە لە کتێبە پێشووەکاندا باسکراوە.

(١٩٧) ئایا لەوەدا بەڵگە و نیشانە نەبوو بۆ ئەو خەڵکە، کە زاناکانی نەوەی ئیسرائیل دەربارەی پێغەمبەر و قورئان، گەلێ شت دەزانن.

(١٩٨) خۆ ئەگەر قورئانمان دابەزاندایە بۆ سەر کەسانێکی تر جگە لە عەرەبەکان...

(١٩٩) بشیخوێندایە بەسەریاندا هەر باوەڕیان پێ نەدەکرد ...

(٢٠٠) هەر ئابەو شێوەیە، بەردەوام کارکردی قورئان لە دڵی تاوانباراندا جێگیر دەکەین...

(٢٠١) کە هەر باوەڕیان پێی نابێت هەتا سزایەکی بەئێش و ئازار دەبینن...

(٢٠٢) کە کوتوپڕ یەخەیان دەگرێت و ئەوان هەست بەنزیک بوونەوەی ناکەن.

(٢٠٣) (ئەو کاتە هاوار دەکەن و) دەڵێن: ئایا ئیتر مۆڵەتمان دەدرێت، ئایا ئیتر جارێکی تر فرسەتمان دەدرێتێ؟!.

(٢٠٤) ئایا ئەوانە پەلەیانە زوو سزای ئێمە یەخەیان بگرێت؟!

(٢٠٥) باشە ئایا ئەگەر ساڵەها مۆڵەتیان بدەین و ژیانی دنیا بەخۆشی ببەنە سەر، باوەڕ دەهێنن؟!

(٢٠٦) پاشان ئەگەر ئەو هەڕەشە و سزایەی کە لەوان کراوە هاتەدی و پێش هات، دەتوانن چی بکەن؟!

مَآ أَغۡنَىٰ عَنۡهُم مَّا كَانُواْ يُمَتَّعُونَ ﴿٢٠٧﴾ وَمَآ أَهۡلَكۡنَا مِن قَرۡيَةٍ إِلَّا
لَهَا مُنذِرُونَ ﴿٢٠٨﴾ ذِكۡرَىٰ وَمَا كُنَّا ظَٰلِمِينَ ﴿٢٠٩﴾ وَمَا تَنَزَّلَتۡ بِهِ
ٱلشَّيَٰطِينُ ﴿٢١٠﴾ وَمَا يَنۢبَغِي لَهُمۡ وَمَا يَسۡتَطِيعُونَ ﴿٢١١﴾ إِنَّهُمۡ
عَنِ ٱلسَّمۡعِ لَمَعۡزُولُونَ ﴿٢١٢﴾ فَلَا تَدۡعُ مَعَ ٱللَّهِ إِلَٰهًا ءَاخَرَ فَتَكُونَ
مِنَ ٱلۡمُعَذَّبِينَ ﴿٢١٣﴾ وَأَنذِرۡ عَشِيرَتَكَ ٱلۡأَقۡرَبِينَ ﴿٢١٤﴾ وَٱخۡفِضۡ
جَنَاحَكَ لِمَنِ ٱتَّبَعَكَ مِنَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ ﴿٢١٥﴾ فَإِنۡ عَصَوۡكَ فَقُلۡ إِنِّي
بَرِيٓءٞ مِّمَّا تَعۡمَلُونَ ﴿٢١٦﴾ وَتَوَكَّلۡ عَلَى ٱلۡعَزِيزِ ٱلرَّحِيمِ ﴿٢١٧﴾ ٱلَّذِي
يَرَىٰكَ حِينَ تَقُومُ ﴿٢١٨﴾ وَتَقَلُّبَكَ فِي ٱلسَّٰجِدِينَ ﴿٢١٩﴾ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلسَّمِيعُ
ٱلۡعَلِيمُ ﴿٢٢٠﴾ هَلۡ أُنَبِّئُكُمۡ عَلَىٰ مَن تَنَزَّلُ ٱلشَّيَٰطِينُ ﴿٢٢١﴾ تَنَزَّلُ عَلَىٰ
كُلِّ أَفَّاكٍ أَثِيمٖ ﴿٢٢٢﴾ يُلۡقُونَ ٱلسَّمۡعَ وَأَكۡثَرُهُمۡ كَٰذِبُونَ ﴿٢٢٣﴾
وَٱلشُّعَرَآءُ يَتَّبِعُهُمُ ٱلۡغَاوُۥنَ ﴿٢٢٤﴾ أَلَمۡ تَرَ أَنَّهُمۡ فِي كُلِّ وَادٖ
يَهِيمُونَ ﴿٢٢٥﴾ وَأَنَّهُمۡ يَقُولُونَ مَا لَا يَفۡعَلُونَ ﴿٢٢٦﴾ إِلَّا ٱلَّذِينَ
ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ وَذَكَرُواْ ٱللَّهَ كَثِيرٗا وَٱنتَصَرُواْ مِنۢ
بَعۡدِ مَا ظُلِمُواْۗ وَسَيَعۡلَمُ ٱلَّذِينَ ظَلَمُوٓاْ أَيَّ مُنقَلَبٖ يَنقَلِبُونَ ﴿٢٢٧﴾

سُورَةُ النَّمۡلِ

(٢٠٧) ئەوسا ئیتر ئەو رابواردنەی دنیایان هیچ فریایان ناکەوێت و بێسوود دەبێت.
(٢٠٨) ئێمە هەر شارو شارۆچکەیەکمان کاول کردبێت بەبێ فرستادە و بێدارخەرەوە نەبووە.
(٢٠٩) تا دابچڵەکێن و بیربکەنەوە، بێگومان هەرگیز ئێمە ستەمکار نەبووین و نابین.
(٢١٠) دڵنیابن کە ئایەتەکانی ئەم قورئانە وەنەبێت لە ڕێگەی شەیتانەکانەوە رەوانەکرابێت.
(٢١١) شتی وا بەوان ناکرێت و هەرگیز ناتوانن بە کاری وا هەستن.
(٢١٢) بێگومان ئەو شەیتانانە لە بیستنی وەحی و فەرمانەکانی خوا کە رادەگەیەنرێت بە فریشتەکان دوور و بەرکەنارن.
(٢١٣) کەواتە ئەی ئیماندار، لەگەڵ خوادا هاناو هاوار بۆ بەناو خوایەکی تر مەبە، چونکە بەهۆی ئەوەوە تۆش لە سزا دراوان دەبیت.
(٢١٤) ئەی محمد ﷺ سەرەتا عەشرەت و تایەفە و کەس وکاری نزیکت بێدار بکەرەوەو بترسێنە.
(٢١٥) باڵی بەزەیی و میهرەبانی خۆت نەوی بکە بۆ ئەو ئیماندارانەی کە شوێنت کەوتوون.
(٢١٦) ئەگەر خوانەناسان یاخی بوون و سەرپێچیان کرد، ئەوە پێیان بڵێ: کە بەڕاستی من بەریم لە هەموو ئەو کارو کردەوانەی کە دەیکەن.
(٢١٧) ئەی محمد ﷺ پشت بەخوای بالادەست و میهرەبان ببەستە.
(٢١٨) ئەو زاتەی کە دەتبینێت کاتێک هەڵدەستیت لە شەوگاردا و دەپەرستیت.
(٢١٩) ئەو زاتە تۆ دەبینێت کە چۆن لە ریزی سوژدەبەراندا هەڵس و کەوت دەکەیت.
(٢٢٠) بەڕاستی ئەو خوایە زاتێکی بیسەرو زانایە (بە گوفتارو نیەتتان).
(٢٢١) ئایا پێتان بڵێم کە شەیتانەکان دادەبەزنە سەر کێ؟
(٢٢٢) دادەبەزنە سەر هەموو کەسێکی بوختانچی و تاوانبارو گوناهکار.
(٢٢٣) شەیتانەکان گوێ هەڵدەخەن بۆ هەواڵی ئاسمان و زۆربەشیان درۆزنن.
(٢٢٤) سەرگەردان و سەرلێشێواوەکانیش شوێنی شاعیران دەکەون.
(٢٢٥) ئایا نابینیت کە ئەوانە لە هەموو دۆڵێکدا سەرهەڵدەدەن و لە هەموو شتێک دەدوێن.
(٢٢٦) بەڕاستی ئەوانە شتێک دەڵێن و بەکردەوە نایکەن (کردارو گوفتاریان دوورە لە یەکەوە).
(٢٢٧) جگە لەوانەیان کە باوەڕیان هێناوە و کردەوە چاکەکانیان ئەنجامداوە و یادی خوایان زۆر کردووە، (بەو توانایەی کە هەیانە) پشتیوانیان کردووە لەو ئیماندارانەی کە ستەمیان لێکراوە، سەرئەنجام ئەوانەی ستەمیان کردووە دەزانن کە بەچۆن تێکشکاویەک دەگەڕێنەوە بۆ لای خواو چۆن ژێرەو ژوور دەبن و تیادەچن.



بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

طسٓ تِلْكَ ءَايَٰتُ ٱلْقُرْءَانِ وَكِتَابٍ مُّبِينٍ ﴿١﴾ هُدًى وَبُشْرَىٰ لِلْمُؤْمِنِينَ ﴿٢﴾ ٱلَّذِينَ يُقِيمُونَ ٱلصَّلَوٰةَ وَيُؤْتُونَ ٱلزَّكَوٰةَ وَهُم بِٱلْءَاخِرَةِ هُمْ يُوقِنُونَ ﴿٣﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ بِٱلْءَاخِرَةِ زَيَّنَّا لَهُمْ أَعْمَٰلَهُمْ فَهُمْ يَعْمَهُونَ ﴿٤﴾ أُو۟لَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ لَهُمْ سُوٓءُ ٱلْعَذَابِ وَهُمْ فِى ٱلْءَاخِرَةِ هُمُ ٱلْأَخْسَرُونَ ﴿٥﴾ وَإِنَّكَ لَتُلَقَّى ٱلْقُرْءَانَ مِن لَّدُنْ حَكِيمٍ عَلِيمٍ ﴿٦﴾ إِذْ قَالَ مُوسَىٰ لِأَهْلِهِۦٓ إِنِّىٓ ءَانَسْتُ نَارًا سَـَٔاتِيكُم مِّنْهَا بِخَبَرٍ أَوْ ءَاتِيكُم بِشِهَابٍ قَبَسٍ لَّعَلَّكُمْ تَصْطَلُونَ ﴿٧﴾ فَلَمَّا جَآءَهَا نُودِىَ أَنۢ بُورِكَ مَن فِى ٱلنَّارِ وَمَنْ حَوْلَهَا وَسُبْحَٰنَ ٱللَّهِ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٨﴾ يَٰمُوسَىٰٓ إِنَّهُۥٓ أَنَا ٱللَّهُ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ ﴿٩﴾ وَأَلْقِ عَصَاكَ فَلَمَّا رَءَاهَا تَهْتَزُّ كَأَنَّهَا جَآنٌّ وَلَّىٰ مُدْبِرًا وَلَمْ يُعَقِّبْ يَٰمُوسَىٰ لَا تَخَفْ إِنِّى لَا يَخَافُ لَدَىَّ ٱلْمُرْسَلُونَ ﴿١٠﴾ إِلَّا مَن ظَلَمَ ثُمَّ بَدَّلَ حُسْنًۢا بَعْدَ سُوٓءٍ فَإِنِّى غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿١١﴾ وَأَدْخِلْ يَدَكَ فِى جَيْبِكَ تَخْرُجْ بَيْضَآءَ مِنْ غَيْرِ سُوٓءٍ فِى تِسْعِ ءَايَٰتٍ إِلَىٰ فِرْعَوْنَ وَقَوْمِهِۦٓ إِنَّهُمْ كَانُوا۟ قَوْمًا فَٰسِقِينَ ﴿١٢﴾ فَلَمَّا جَآءَتْهُمْ ءَايَٰتُنَا مُبْصِرَةً قَالُوا۟ هَٰذَا سِحْرٌ مُّبِينٌ ﴿١٣﴾

سورەتی (النمل)

بەناوی خوای بەخشندە و میهرەبان

(١) سەرنجی سەرەتای سورەتی (البقرة) بدە، ئەوە ئایەتەکانی ئەم قورئانەن و فەرمانی کتێبێکی پیرۆزو ئاشکرا و روونە.

(٢) رێنموویی بەخش و مژدە بەخشە بە ئیمانداران (لە هەموو سەردەمێکدا).

(٣) ئەوانەی کە نوێژەکانیان بەچاکی ئەنجام دەدەن و زەکات دەبەخشن و باوەڕێکی بەتین و دامەزراویان بە رۆژی قیامەت هەیە.

(٤) بێگومان ئەوانەی باوەڕ بەقیامەت ناهێنن، کارو کردەوە خراپەکانمان لەبەرچاو جوان کردوون، لەبەر ئەوە چاوی دڵیان کوێر بووە و خراپی کردارەکانیان نابینن.

(٥) ئائەوانە ئەوانەن ناخۆشترین وناسۆرترین سزا بۆیان ئامادەیە و ئەوان لە قیامەتدا لە هەموو کەس خەسارەتمەندترن.

(٦) ئەی محمد ﷺ بەڕاستی تۆ لەلایەن زاتێکی داناو زاناوە قورئان فێر دەکرێیت و پێت دەدرێت.

(٧) یادیان بهێنە، کاتێک موسا (لە رێگای گەڕانەوەیدا بۆ میسر) بە هاوسەرەکەی وت: (ئێوە لێرەدا بمێننەوە) بەڕاستی من ئاگرێکم بەدی کردووە و دڵم پێی خۆشە، لەوێوە هەواڵێکتان بۆ دەهێنم، یان سەلکە بزوتێکتان بۆ دەهێنم، بۆ ئەوەی خۆتانی پێ گەرم بکەنەوە.

(٨) جا کاتێک گەیشتە لای ئەوەی بەئاگری زانی (بینی نوورو رووناکیەکی بێ وێنەیە) بانگی لێکرا: پیرۆزە ئەو کەسەی کە لەپاڵ ئاگرەکەدایە و ئەو فریشتانەش کە لەجێی ئاگرە تایبەتیەکەدا هەن، پاکی و بێگەردی بۆ خوایە، کە پەروەردگاری هەموو جیهانیانە.

(٩) ئەی موسا ئەو کەسەی قسەت بۆ دەکات ئەوە بەڕاستی منم، ئەو خوایەی کە باڵادەست و دانایە.

(١٠) عەساکەت فڕێ بدە، جا کاتێک فڕێی‌دا بینی، وەکو تولەمار بەخێرایی دەجوولا، موسا هەڵات و پشتی تێکرد و ئاوڕی نەدایەوە، (ئەوسا خوای گەورە فەرمووی): ئەی موسا مەترسە، چونکە بەڕاستی پێغەمبەران لە لای من ناترسن و بیمیان نیە...

(١١) مەگەر کەسێک ستەمێکی کردبێت و پاشان چاکەکاری ئەنجام بدات دوای ئەوەی پێشتر هەڵەی هەبوو، ئەوە من بۆ ئەو جۆرە کەسانە لێخۆشبوو میهرەبانم.

(١٢) جا دەستەکەت بخەرە گیرفانتەوە، هەرکە دەرتهێنا بە سپییەکی بێ عەیب دێتە دەرەوە، ئەم دوو ـ موعجیزە یە لە ریزی نۆ ـ موعجیزە ـ دایە بۆ فیرعەون و قەومەکەی، بەڕاستی ئەوانە قەومێکی لە سنوور دەرچوو بوون.

(١٣) جاکاتێک ـ موعجیزە ـ کانی ئێمەیان بە روونی و ئاشکرا بۆ هات و خرایە بەرچاویان وتیان: ئەمە جادوویەکی ئاشکرایە...

وَجَحَدُواْ بِهَا وَٱسْتَيْقَنَتْهَآ أَنفُسُهُمْ ظُلْمًا وَعُلُوًّا ۚ فَٱنظُرْ كَيْفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلْمُفْسِدِينَ ﴿١٤﴾ وَلَقَدْ ءَاتَيْنَا دَاوُۥدَ وَسُلَيْمَٰنَ عِلْمًا ۖ وَقَالَا ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ ٱلَّذِى فَضَّلَنَا عَلَىٰ كَثِيرٍ مِّنْ عِبَادِهِ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴿١٥﴾ وَوَرِثَ سُلَيْمَٰنُ دَاوُۥدَ ۖ وَقَالَ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ عُلِّمْنَا مَنطِقَ ٱلطَّيْرِ وَأُوتِينَا مِن كُلِّ شَىْءٍ ۖ إِنَّ هَٰذَا لَهُوَ ٱلْفَضْلُ ٱلْمُبِينُ ﴿١٦﴾ وَحُشِرَ لِسُلَيْمَٰنَ جُنُودُهُۥ مِنَ ٱلْجِنِّ وَٱلْإِنسِ وَٱلطَّيْرِ فَهُمْ يُوزَعُونَ ﴿١٧﴾ حَتَّىٰٓ إِذَآ أَتَوْاْ عَلَىٰ وَادِ ٱلنَّمْلِ قَالَتْ نَمْلَةٌ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّمْلُ ٱدْخُلُواْ مَسَٰكِنَكُمْ لَا يَحْطِمَنَّكُمْ سُلَيْمَٰنُ وَجُنُودُهُۥ وَهُمْ لَا يَشْعُرُونَ ﴿١٨﴾ فَتَبَسَّمَ ضَاحِكًا مِّن قَوْلِهَا وَقَالَ رَبِّ أَوْزِعْنِىٓ أَنْ أَشْكُرَ نِعْمَتَكَ ٱلَّتِىٓ أَنْعَمْتَ عَلَىَّ وَعَلَىٰ وَٰلِدَىَّ وَأَنْ أَعْمَلَ صَٰلِحًا تَرْضَىٰهُ وَأَدْخِلْنِى بِرَحْمَتِكَ فِى عِبَادِكَ ٱلصَّٰلِحِينَ ﴿١٩﴾ وَتَفَقَّدَ ٱلطَّيْرَ فَقَالَ مَا لِىَ لَآ أَرَى ٱلْهُدْهُدَ أَمْ كَانَ مِنَ ٱلْغَآئِبِينَ ﴿٢٠﴾ لَأُعَذِّبَنَّهُۥ عَذَابًا شَدِيدًا أَوْ لَأَا۟ذْبَحَنَّهُۥٓ أَوْ لَيَأْتِيَنِّى بِسُلْطَٰنٍ مُّبِينٍ ﴿٢١﴾ فَمَكَثَ غَيْرَ بَعِيدٍ فَقَالَ أَحَطتُ بِمَا لَمْ تُحِطْ بِهِۦ وَجِئْتُكَ مِن سَبَإٍۭ بِنَبَإٍ يَقِينٍ ﴿٢٢﴾

جا ئەوانە هەر رق ئەستووربیان کردو باوەڕیان پێی نەبوو، بە زۆرداری و خۆبەزلزانی، لەکاتێکدا لەناخی دەروونیانەوە هەستیان دەکرد حەقیقەتە و راستە، دە تەماشا بکە و سەرنج بدە بزانە سەرەنجامی تاوانباران و گوناهکاران چۆن بوو (چۆن تۆڵەمان لیّ سەندن).

سوێند بەخوا بێگومان ئێمە بە داود و سولەیمان زانیاری و زانستیمان بەخشی، هەردووکیان وتیان: سوپاس و ستایش بۆ ئەو خوایەی کە زیادە رێزی ئێمەی داوە بەسەر زۆرێک لە بەندە ئیماندارەکانیدا.

سولەیمان جێنشینی داودی باوکی بوو، رۆژێک وتی: ئەی خەڵکینە ئێمە فێری زمانی باڵندە کراوین و لە هەموو شتێکمان پێدراوە، بەڕاستی ئەمە هەر فەزڵ و رێزێکی ئاشکرایە (لەلایەن خواوە پێمان بەخشراوە).

هەرچی سەربازولەشکری سولەیمان هەبوو لە پەری و ئادەمیزاد و باڵندەکان کۆکرانەوە و نمایشیان کرد بە ریز و رێک و پێکی هەموویان بە سەرەتاو کۆتاییان یەکیان گرت.

هەتا گەیشتنە دۆڵی مێرووله، مێرووله مێچکەیەک (هاواری کرد و) وتی: ئەهای مێروولەینە، بچنە ماڵ و کون و کەلەبەرەکانتانەوە نەوەکو سولەیمان و سەربازانی پێشێلتان بکەن، لەکاتێکدا هەستتان پێناکەن.

سولەیمان (کە گوێی لە هاواری مێروولەکە بوو) زەردەخەنە گرتی و پێکەنی بە هاوارو قسەکەی، بۆیە وتی: پەروەردگارا، یارمەتیم بدە دڵ و دەروون و رۆح و گیانم کۆبکەرەوە، تا سوپاسگوزاری نازو نیعمەتەکانت بم کە بەسەر من و دایک و باوکمدا رژاندووتە، هەروەها کۆمەکیم بکە تا کاروکردەوەی چاکە ئەنجام بدەم کە تۆ پێی رازیی بیت و بە رەحمەت و میهرەبانی خۆت بمخەرە ریزی بەندە چاکەکانتەوە.

(ئینجا سولەیمان) کەوتە بەسەر کردنەوە و پشکنینی دەستە و تاقمی باڵندەکان و وتی: ئەوە بۆچی من پەپوو نابینم؟ یاخود لێرە نیە و خۆی دزیوەتەوە و لە نادیارەکانە!!

سوێند بێت ئەبێت سزایەکی زۆر سەختی بدەم یان سەری ببڕم، یان دەبێت بە بەڵگەیەکی ئاشکراوە بێت بۆ لام.

(سولەیمان) زۆر چاوەڕێی نەکرد (پەپوو پەیدابوو، یەکسەر هات و نیشتەوە و) وتی: ئەوەی من پێم زانیووە تۆ پێت نەزانیووە، من لە وڵاتی سەبەئەوە هەواڵێکی راست و دروستم بۆ هێناویت!!

إِنِّي وَجَدتُّ ٱمۡرَأَةٗ تَمۡلِكُهُمۡ وَأُوتِيَتۡ مِن كُلِّ شَيۡءٖ وَلَهَا عَرۡشٌ عَظِيمٞ ﴿٢٣﴾ وَجَدتُّهَا وَقَوۡمَهَا يَسۡجُدُونَ لِلشَّمۡسِ مِن دُونِ ٱللَّهِ وَزَيَّنَ لَهُمُ ٱلشَّيۡطَٰنُ أَعۡمَٰلَهُمۡ فَصَدَّهُمۡ عَنِ ٱلسَّبِيلِ فَهُمۡ لَا يَهۡتَدُونَ ﴿٢٤﴾ أَلَّا يَسۡجُدُواْۤ لِلَّهِ ٱلَّذِي يُخۡرِجُ ٱلۡخَبۡءَ فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ وَيَعۡلَمُ مَا تُخۡفُونَ وَمَا تُعۡلِنُونَ ﴿٢٥﴾ ٱللَّهُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ رَبُّ ٱلۡعَرۡشِ ٱلۡعَظِيمِ۩ ﴿٢٦﴾ ۞ قَالَ سَنَنظُرُ أَصَدَقۡتَ أَمۡ كُنتَ مِنَ ٱلۡكَٰذِبِينَ ﴿٢٧﴾ ٱذۡهَب بِّكِتَٰبِي هَٰذَا فَأَلۡقِهۡ إِلَيۡهِمۡ ثُمَّ تَوَلَّ عَنۡهُمۡ فَٱنظُرۡ مَاذَا يَرۡجِعُونَ ﴿٢٨﴾ قَالَتۡ يَٰٓأَيُّهَا ٱلۡمَلَؤُاْ إِنِّيٓ أُلۡقِيَ إِلَيَّ كِتَٰبٞ كَرِيمٌ ﴿٢٩﴾ إِنَّهُۥ مِن سُلَيۡمَٰنَ وَإِنَّهُۥ بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ ﴿٣٠﴾ أَلَّا تَعۡلُواْ عَلَيَّ وَأۡتُونِي مُسۡلِمِينَ ﴿٣١﴾ قَالَتۡ يَٰٓأَيُّهَا ٱلۡمَلَؤُاْ أَفۡتُونِي فِيٓ أَمۡرِي مَا كُنتُ قَاطِعَةً أَمۡرًا حَتَّىٰ تَشۡهَدُونِ ﴿٣٢﴾ قَالُواْ نَحۡنُ أُوْلُواْ قُوَّةٖ وَأُوْلُواْ بَأۡسٖ شَدِيدٖ وَٱلۡأَمۡرُ إِلَيۡكِ فَٱنظُرِي مَاذَا تَأۡمُرِينَ ﴿٣٣﴾ قَالَتۡ إِنَّ ٱلۡمُلُوكَ إِذَا دَخَلُواْ قَرۡيَةً أَفۡسَدُوهَا وَجَعَلُوٓاْ أَعِزَّةَ أَهۡلِهَآ أَذِلَّةٗۚ وَكَذَٰلِكَ يَفۡعَلُونَ ﴿٣٤﴾ وَإِنِّي مُرۡسِلَةٌ إِلَيۡهِم بِهَدِيَّةٖ فَنَاظِرَةُۢ بِمَ يَرۡجِعُ ٱلۡمُرۡسَلُونَ ﴿٣٥﴾



(٢٣) بەڕاستی من بۆم دەركەوت ئافرەتێك فەرمانڕەوایییان دەكات و لە هەموو جۆرە دەسەڵات و نازو نیعمەتێكی پێبەخشراوە، تەختێكی پاشایەتی گەورەشی هەیە، بینیم خۆی و قەومەكەی سوژدە بۆ خۆر دەبەن لەجیاتی خوا، شەیتان كارو كردەوەی چەوتیانی بۆ ڕازاندوونەتەوە، بەو هۆیەوە ڕێبازی ڕاست و دروستی لێگرتوون، بۆیە ئەوان ڕێنموویی وەرناگرن.

(٢٥) (شەیتان ڕێی لێگرتن) بۆ ئەوەی سوژدە نەبەن بۆ ئەو خوایەی كە نهێنی دەردەكێشێت لە ئاسمانەكان و زەویداو دەزانێت ئێوە چی دەشارنەوە و چیش ئاشكرا دەكەن...

(٢٦) خوا ئەو زاتەیە كە جگە لەو خوایەكی تر نیە، خاوەنی تەختی مەزن و گەورەیە.

(٢٧) سولەیمان وتی بە پەپوو: ئێمە لەمەودوا لەو گوفتارەی تۆ دەكۆڵینەوە، تا بزانین ڕاست دەكەیت یان لە ڕیزی درۆزنانیت.

(٢٨) (ئەوسا سولەیمان نامەیەكی نووسی و دای بە پەپوو فەرمانی پێدا كە): بڕۆ ئەم نامەیە ببە و (لە شوێنێكی بەرچاودا) بۆیان فڕێ بدە و پاشان (لە پەنایەكدا) خۆت حەشار بدە و بزانە دەڵێن چی و چ باس و خواسێك دەكەن.

(٢٩) (شاژن هات و نامەی بینی و خوێندیەوە، پاشان وەزیران و ئەنجومەنەكەی خۆی كۆكردەوە و) ووتی: ئەی ڕێزداران، بەڕاستی من نامەیەكی پیرۆزو بەڕێزم بۆ دانراوە.

(٣٠) نامەكە لە سولەیمانەوەیە و بەناوی خوای بەخشندە و میهرەبانەوە (دەست پێ دەكات و دەڵێت):

(٣١) خۆتان بەگەورە مەزانن و لێم یاخی مەبن و وەرن موسوڵمان ببن (واز لە خۆرپەرستی بهێنن و بەدیهێنەری خۆرو مانگ و ئەستێرە و زەوی و...هتد، بپەرستن).

(٣٢) ئینجا بەڵقیس بە ئامادە بووانی وت: ئەی ڕێزداران ڕاتان چیە، چی بكەم باشە، خۆ من هیچ بڕیارێكم نەداوە هەتا ئێوە لێی ئاگادار نەبووبن و ڕاتان لەسەری نەدابێت.

(٣٣) ئەنجومەنەكەی وتیان: خۆت دەزانیت كە ئێمە خاوەنی هێزو تواناو دەسەڵاتی توندو تیژین، فەرمانیش فەرمانی تۆیە، بیر بكەرەوە و تێفكرە چ فەرمانێك دەدەیت (ئێمە ئامادەین).

(٣٤) بەڵقیس وتی: بەڕاستی لەشكری پاشاكان كاتێك چوونە شارو دێهاتەكانەوە، وێران و كاولیان كردووە و تۆوی خراپەیان چاندووە، كەسانی خاوەن دەسەڵات و پیاوی ناوداری ئەو شوێنەیان زەلیل و ڕیسوا كردووە و هەمیشە ئەوە پیشەیانە و بەو جۆرە دەكەن و هەرواش دەبن (بێگومان من حەز لەكارەساتی وا ناكەم)...

(٣٥) بێگومان لەبەرئەوە من بڕیارمداوە كە: دیاریەكیان بۆ بنێرم، جا چاوەڕێ دەكەم بزانم نوێنەرەكان چ هەواڵێكم بۆ دەهێننەوە و (هەڵوێستی سولەیمان چۆن دەبێت).

فَلَمَّا جَآءَ سُلَيْمَـٰنَ قَالَ أَتُمِدُّونَنِ بِمَالٍ فَمَآ ءَاتَىٰنِۦَ ٱللَّهُ خَيْرٌ مِّمَّآ ءَاتَىٰكُم بَلْ أَنتُم بِهَدِيَّتِكُمْ تَفْرَحُونَ ﴿٣٦﴾ ٱرْجِعْ إِلَيْهِمْ فَلَنَأْتِيَنَّهُم بِجُنُودٍ لَّا قِبَلَ لَهُم بِهَا وَلَنُخْرِجَنَّهُم مِّنْهَآ أَذِلَّةً وَهُمْ صَـٰغِرُونَ ﴿٣٧﴾ قَالَ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلْمَلَؤُا۟ أَيُّكُمْ يَأْتِينِى بِعَرْشِهَا قَبْلَ أَن يَأْتُونِى مُسْلِمِينَ ﴿٣٨﴾ قَالَ عِفْرِيتٌ مِّنَ ٱلْجِنِّ أَنَا۠ ءَاتِيكَ بِهِۦ قَبْلَ أَن تَقُومَ مِن مَّقَامِكَ وَإِنِّى عَلَيْهِ لَقَوِىٌّ أَمِينٌ ﴿٣٩﴾ قَالَ ٱلَّذِى عِندَهُۥ عِلْمٌ مِّنَ ٱلْكِتَـٰبِ أَنَا۠ ءَاتِيكَ بِهِۦ قَبْلَ أَن يَرْتَدَّ إِلَيْكَ طَرْفُكَ فَلَمَّا رَءَاهُ مُسْتَقِرًّا عِندَهُۥ قَالَ هَـٰذَا مِن فَضْلِ رَبِّى لِيَبْلُوَنِىٓ ءَأَشْكُرُ أَمْ أَكْفُرُ وَمَن شَكَرَ فَإِنَّمَا يَشْكُرُ لِنَفْسِهِۦ وَمَن كَفَرَ فَإِنَّ رَبِّى غَنِىٌّ كَرِيمٌ ﴿٤٠﴾ قَالَ نَكِّرُوا۟ لَهَا عَرْشَهَا نَنظُرْ أَتَهْتَدِىٓ أَمْ تَكُونُ مِنَ ٱلَّذِينَ لَا يَهْتَدُونَ ﴿٤١﴾ فَلَمَّا جَآءَتْ قِيلَ أَهَـٰكَذَا عَرْشُكِ قَالَتْ كَأَنَّهُۥ هُوَ وَأُوتِينَا ٱلْعِلْمَ مِن قَبْلِهَا وَكُنَّا مُسْلِمِينَ ﴿٤٢﴾ وَصَدَّهَا مَا كَانَت تَّعْبُدُ مِن دُونِ ٱللَّهِ إِنَّهَا كَانَتْ مِن قَوْمٍ كَـٰفِرِينَ ﴿٤٣﴾ قِيلَ لَهَا ٱدْخُلِى ٱلصَّرْحَ فَلَمَّا رَأَتْهُ حَسِبَتْهُ لُجَّةً وَكَشَفَتْ عَن سَاقَيْهَا قَالَ إِنَّهُۥ صَرْحٌ مُّمَرَّدٌ مِّن قَوَارِيرَ قَالَتْ رَبِّ إِنِّى ظَلَمْتُ نَفْسِى وَأَسْلَمْتُ مَعَ سُلَيْمَـٰنَ لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَـٰلَمِينَ ﴿٤٤﴾

(٣٦) جا کاتێک (نوێنەری) نێردراوەکان گەیشتە لای سولەیمان، (هەواڵی دیاریەکەی گەیاند، سولەیمان بە تووڕەییەوە) پێی وت: ئێوە دەتانەوێت بە ماڵ و سامان و دیاری کۆمەکیم بکەن؟! من دڵنیام کە ئەو شتانەی خوا پێی بەخشیووم لەوە چاکترو بەنرخترە کە بە ئێوەی بەخشیووە، نەخێر من بەو دیاریە دڵشاد نابم، بەڵکو ئێوەن بەدیاریەکەتان شاد دەبن.

(٣٧) (ئەی نوێنەری بەلقیس) بگەڕێرەوە بۆ لایان بەخۆت و دیاریەکەتەوە، سوێند بەخوا دەبێت بە سەربازانێکەوە بچینە سەریان کە نەیان دیبێت و نەتوانن بەرگری بکەن، دەبێت دەریان بکەین لە وڵاتیان لەکاتێکدا ئەوان زەلیل و ریسواو شکاون.

(٣٨) (سولەیمان زانی هەڕەشەکەی کاریگەر دەبێت بۆیە روو بەئەندامانی حکومەتەکەی) وتی: ئەی خەڵکینە کامتان دەتوانێت تەختی شاژنە بەڵقیسم بۆ بهێنێت پێش ئەوەی بێن بۆ لام و تەسلیم ببن.

(٣٩) دێوێک لە پەریەکان وتی: من بۆت دەهێنم پێش ئەوەی دەوام تەواو ببێت و لەجێی خۆت هەستیت، بەڕاستی من بۆ ئەو کارە خۆم بە بەهێزو ئەمین دەزانم.

(٤٠) (بەلام یەکێک لە پیاوچاکان) کە زانستی و زانیاری لە (نهێنیەکانی) کتێبی تەورات هەبوو وتی: من بۆت دەهێنم بەچاو تروکاندنێک (دەستی کرد بەنزاو پاڕانەوە و داوای لەخوا کرد)، ئەوسا کتوپڕ سولەیمان بینی تەختی پاشایەتی لەلایدا دانراوە وتی: ئەمە لە فەزڵ و بەخششەکانی پەروەردگارمە بۆ ئەوەی تاقیم بکاتەوە.. کە: ئایا سوپاسگوزار دەبم یان ناشوکرو بەدنمەک، جا ئەوەی سوپاسگوزاربێت ئەوە بەڕاستی سوپاسگوزارە بۆ خۆی، ئەوەش کە سپڵەیە، ئەوە بێگومان پەروەردگارم دەوڵەمەند و بێنیازە و خاوەنی بەخششە بە هەمووان (رایەکیش هەیە لەسەر ئەوەی کە ئەو کەسە سولەیمان خۆی بووە).

(٤١) (ئینجا سولەیمان فەرمانیداو) وتی: تەختی پاشایەتیەکەی دەستکاری بکەن (هەندێک رەنگ و نەخشی بگۆڕن) سەرنج دەدەین بزانین بەڵقیس دەیناسێتەوە، یان لەو کەسانە دەبێت کە ناینا‌سنەوە.

(٤٢) جا کاتێک بەڵقیس گەیشت، پێی وترا: تەختی پاشایەتی تۆ ئاوایە؟! بەڵقیس وتی: هەر دەڵێی ئەوەو لەو دەچێت، ئێمە پێش ئەمەش زانیاریمان هەبوو (دەربارەی تواناو دەسەلاتی سولەیمان) ئێمە تەسلیم بووین(نیازی جەنگمان نیە).

(٤٣) ئەو شتانەی کە بەڵقیس دەیپەرست لەجیاتی خوا بووبوونە بەربەست لە دڵ و دەروونیدا لە بەرامبەر ئاینی خوادا، بەڕاستی ئەو کاتی خۆی لە ریزی قەومێکی بێ باوەڕ و خوانەناسدا بوو.

(٤٤) ئەوسا پێی وترا بچۆرە کۆشکەکەوە، (کاتێک بەرەو کۆشک کەوتەڕێ، ئاوێک لەبەردەم کۆشکەکەدا بوو، بە شووشە سەری گیرابوو) جا کە بەڵقیس بینی وای زانی ئاوێکی زۆرە و قاچی خۆی هەڵکرد تاتەڕ نەبێت، سولەیمان وتی: ئەو پانتاییە بە شووشە سەری گیراوە (بەڵقیس سەرسام بوو لە دەسەلات و کۆشک و تەلارو نازو نیعمەتی مادی و مەعنەوی کە خوای گەورە بە سولەیمانی بەخشیووە بۆیە) وتی: پەروەردگارا من بەڕاستی تا ئێستا ستەمم لەخۆم کردووە، ئیتر وا لەگەڵ سولەیماندا تەسلیمی خوای پەروەردگاری جیهانیان بووم.

وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا إِلَىٰ ثَمُودَ أَخَاهُمْ صَالِحًا أَنِ اعْبُدُوا اللَّهَ فَإِذَا هُمْ فَرِيقَانِ يَخْتَصِمُونَ ﴿٤٥﴾ قَالَ يَا قَوْمِ لِمَ تَسْتَعْجِلُونَ بِالسَّيِّئَةِ قَبْلَ الْحَسَنَةِ ۖ لَوْلَا تَسْتَغْفِرُونَ اللَّهَ لَعَلَّكُمْ تُرْحَمُونَ ﴿٤٦﴾ قَالُوا اطَّيَّرْنَا بِكَ وَبِمَن مَّعَكَ ۚ قَالَ طَائِرُكُمْ عِندَ اللَّهِ ۖ بَلْ أَنتُمْ قَوْمٌ تُفْتَنُونَ ﴿٤٧﴾ وَكَانَ فِي الْمَدِينَةِ تِسْعَةُ رَهْطٍ يُفْسِدُونَ فِي الْأَرْضِ وَلَا يُصْلِحُونَ ﴿٤٨﴾ قَالُوا تَقَاسَمُوا بِاللَّهِ لَنُبَيِّتَنَّهُ وَأَهْلَهُ ثُمَّ لَنَقُولَنَّ لِوَلِيِّهِ مَا شَهِدْنَا مَهْلِكَ أَهْلِهِ وَإِنَّا لَصَادِقُونَ ﴿٤٩﴾ وَمَكَرُوا مَكْرًا وَمَكَرْنَا مَكْرًا وَهُمْ لَا يَشْعُرُونَ ﴿٥٠﴾ فَانظُرْ كَيْفَ كَانَ عَاقِبَةُ مَكْرِهِمْ أَنَّا دَمَّرْنَاهُمْ وَقَوْمَهُمْ أَجْمَعِينَ ﴿٥١﴾ فَتِلْكَ بُيُوتُهُمْ خَاوِيَةً بِمَا ظَلَمُوا ۗ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَةً لِّقَوْمٍ يَعْلَمُونَ ﴿٥٢﴾ وَأَنجَيْنَا الَّذِينَ آمَنُوا وَكَانُوا يَتَّقُونَ ﴿٥٣﴾ وَلُوطًا إِذْ قَالَ لِقَوْمِهِ أَتَأْتُونَ الْفَاحِشَةَ وَأَنتُمْ تُبْصِرُونَ ﴿٥٤﴾ أَئِنَّكُمْ لَتَأْتُونَ الرِّجَالَ شَهْوَةً مِّن دُونِ النِّسَاءِ ۚ بَلْ أَنتُمْ قَوْمٌ تَجْهَلُونَ ﴿٥٥﴾

(٤٥) سوێند بە خوا بۆ هۆزی (ثـمود) یش صالحی برایانمان نارد، فەرمانمان پێدا کە پێیان بڵێ: تەنـها خـوا بپەرسـتن، کـەچی دەستبەجێ خەڵکەکە بوون بە دوو دەستەوە و کێشە و ناخۆشی لە نێوانیاندا بەرپا بوو.

صالح پێی وتـن: ئـەی قـەوم و کەسـم بۆچی ئێوە پەلەی خراپەتانە پێش چاکە و حـەز دەکـەن بـەڵاو ناخۆشیتان بەسەر بێت، ئـەی بۆچی داوای لێخۆشبوون لـە خـوا ناکـەن بـۆ ئـەوەی رەحمتـان پـێ بکرێـت (خـوای گـەورە دەرووی زیاترتان لێ بکاتەوە).

خەڵکەکە وتیان: ئێمە تووشی شـووم و نەگبـەتی بوویـن بـەهۆی تـۆو ئەوانـەی لەگـەڵ تۆدان، صالح وتی: نەخێر وانی‌یە، نەگبـەتی و شـوومتان لەلایـەن خواوە بـۆ دێـت (ئەگـەر بەردەوام بن لەسەر یاخی بوونتان)، بەڵکو ئێوە قەومێکن کە تاقی دەکرێنەوە.

لەو شارەدا نـۆ دەستە هەبوو کەگوناهو تاوانیان ئەنجام دەداو تۆوی خراپەیان لە وڵاتدا دەچاند و بەلای چاکە و چاکەکاریدا نەدەچوون.

(٤٩) هەموویـان سوێندیـان بـەخوا بۆ یەکـتر خـوارد کە لـەشەودا بدەن بەسەرصالح و ماڵ و منداڵیدا و لـەناویان بـەرن، پاشـان (ئەگـەر گومانیـان لێکـردین) سـوێند دەخۆیـن و بـە کەس و کاری دەڵێین: ئێمە ئاگامان لـە تیاچوونـی ئەوان نیە و دڵنیابن ئێمە راستگۆشین.

(٥٠) (ئەو تاوانبارانە) پیلان و تەڵەکەیان گێڕا (بۆ لەناوبردنی صالح و شوێنکەوتووانی) ئێمـەش نەخشـەیەکی ترمان کێشا (بۆ رزگارکردنی ئیمانداران و لەناوبردنی خوانەناسان) ئەوان ئاگایان لێ نەبوو، هەستیان پێ نەدەکرد.

(٥١) جا ئیتر سەرنج بدە و تەماشاکە، سەرئەنجامی پیلانەکەیان چیان بەسەرهات، بەڕاسـتی ئێمـە ئـەوانیش و هەموو قەومەکەیانمان لەناوبرد (بەهۆی بومەلەرزەوە).

(٥٢) ئەوەتە ماڵەکانیان کاول و چۆڵە بەهۆی ئەو ستەمەی کە کردیان، بەڕاستی ئـا لـەو بەسـەرهاتەدا بەڵگـە و نیشانەی تەواو هەیە بۆ کەسانێک کە لە شت تێبگەن و بزانن.

(٥٣) ئەوسا ئێمە ئەو کەسانەمان رزگارکرد کە باوەڕیان هێنابوو و ئەوانە پارێزکار بوون و لە خوا دەترسان.

(٥٤) (لوط پێغەمبەریش) کاتێ خۆی بە قەومەکەی وت: باشە، ئایا ئێوە ئـەوکارە نابـەجێ و تـاوان و گوناهـە ئەنجام دەدەن؟!، لەکاتێکدا ئێوە چاوتان هەیە و دەزانن (چۆن شەرمەزارو خەجاڵەت و ریسوا نابن).

(٥٥) ئایا رەوایە کە ئارەزووی خۆتان لەگەڵ پیاواندا ئەنجام بدەن لەجیاتی ژنان؟! نـەخێر ئێـوە ژیرنـین، بـەڵکو ئێوە گەلێکن سەرەنجامی ئەم ئیشە خراپە نازانن.



﴿فَمَا كَانَ جَوَابَ قَوْمِهِۦٓ إِلَّآ أَن قَالُوٓا۟ أَخْرِجُوٓا۟ ءَالَ لُوطٍ مِّن قَرْيَتِكُمْ ۖ إِنَّهُمْ أُنَاسٌ يَتَطَهَّرُونَ ﴿٥٦﴾ فَأَنجَيْنَـٰهُ وَأَهْلَهُۥٓ إِلَّا ٱمْرَأَتَهُۥ قَدَّرْنَـٰهَا مِنَ ٱلْغَـٰبِرِينَ ﴿٥٧﴾ وَأَمْطَرْنَا عَلَيْهِم مَّطَرًا ۖ فَسَآءَ مَطَرُ ٱلْمُنذَرِينَ ﴿٥٨﴾ قُلِ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ وَسَلَـٰمٌ عَلَىٰ عِبَادِهِ ٱلَّذِينَ ٱصْطَفَىٰٓ ۗ ءَآللَّهُ خَيْرٌ أَمَّا يُشْرِكُونَ ﴿٥٩﴾ أَمَّنْ خَلَقَ ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ وَأَنزَلَ لَكُم مِّنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءً فَأَنۢبَتْنَا بِهِۦ حَدَآئِقَ ذَاتَ بَهْجَةٍ مَّا كَانَ لَكُمْ أَن تُنۢبِتُوا۟ شَجَرَهَآ ۗ أَءِلَـٰهٌ مَّعَ ٱللَّهِ ۚ بَلْ هُمْ قَوْمٌ يَعْدِلُونَ ﴿٦٠﴾ أَمَّن جَعَلَ ٱلْأَرْضَ قَرَارًا وَجَعَلَ خِلَـٰلَهَآ أَنْهَـٰرًا وَجَعَلَ لَهَا رَوَٰسِىَ وَجَعَلَ بَيْنَ ٱلْبَحْرَيْنِ حَاجِزًا ۗ أَءِلَـٰهٌ مَّعَ ٱللَّهِ ۚ بَلْ أَكْثَرُهُمْ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٦١﴾ أَمَّن يُجِيبُ ٱلْمُضْطَرَّ إِذَا دَعَاهُ وَيَكْشِفُ ٱلسُّوٓءَ وَيَجْعَلُكُمْ خُلَفَآءَ ٱلْأَرْضِ ۗ أَءِلَـٰهٌ مَّعَ ٱللَّهِ ۚ قَلِيلًا مَّا تَذَكَّرُونَ ﴿٦٢﴾ أَمَّن يَهْدِيكُمْ فِى ظُلُمَـٰتِ ٱلْبَرِّ وَٱلْبَحْرِ وَمَن يُرْسِلُ ٱلرِّيَـٰحَ بُشْرًۢا بَيْنَ يَدَىْ رَحْمَتِهِۦٓ ۗ أَءِلَـٰهٌ مَّعَ ٱللَّهِ ۚ تَعَـٰلَى ٱللَّهُ عَمَّا يُشْرِكُونَ ﴿٦٣﴾

کەچی وەڵامی قەومەکەی هیچ نەبوو تەنها ئەوە نەبێت کە وتیان:(لوط) و شوێنکەوتووانی لە شارەکەتان دەربکەن، چونکە بەڕاستی ئەوانە کەسانێکن خۆیان بەپاک رادەگرن!!

سەرەنجام ئێمە (لوط) و خاوو خێزانیمان رزگارکرد جگە لە ژنەکەی کە بڕیارمان دابوو لە تیاچوواں بێت (چونکە هەڵوێستی چاک نەبوو، باوەری بە مێردی پێغەمبەری نەبوو).

(لە بەرەبەیاندا) بەردبارانمان کردن، ئای کە بەردبارانی بێدارکراوەکان سەخت و دژوارە!

(ئەی پێغەمبەر ئەی ئیماندار) بڵێ: سوپاس و ستایش بۆ خوای میهرەبان، سڵاو لەسەر ئەو بەندانەش کە هەڵی بژاردووە، ئایا ئەو خوا میهرەبانە چاکترە (کە بپەرسترێت وپەیڕەوی بەرنامەکەی بکرێت) یان ئەوانەی ئەوان دەیکەنە شەریک و هاوەڵ بۆی؟

(ئایا شەریک و هاوەڵ چاکترە بپەرسترێت) یان ئەو زاتەی کە ئاسمانەکان و زەوی دروست کردووە و لە ئاسمانەوە بارانی باراندووە، جا باغ و بێستانی جوان و رازاوەمان پێ بەرهەم هێناوە، ئێوە نەتاندەتوانی درەختەکانی بروێنن، چ جای بەرو بوومەکەی، ئایا رەوایە، کە خوایەکی تر لەگەڵ خوای پەروەردگاردا هەبێت؟! نەخێر، لەگەڵ ئەو هەموو بەڵگانەدا زۆربەی ئەو خەڵکە لە رێبازی راست لادەدەن و شوێنی چەوتی و ناردوستی دەکەون.

(٦١) (ئایا تەنها ئەو زاتە نیە) کە زەوی دامەزراندووە و لەناویدا جۆگە و رووباری رەخساندووە، هەروەها زنجیرە چیای تیادا چەسپاندووە، لە نێوان دوو دەریاکەشدا بەربەستی بەرپا کردووە (کە ئاوی شیرین وسوێر تێکەڵ نابن) ئایا رەوایە خوایەکی تر لەگەڵ خوای پەروەردگاردا هەبێت؟!، نەخێر وا نییە، لەگەڵ ئەو هەموو بەڵگانەدا زۆربەی ئەو خەڵکە (ئەم راستیانە) نازانن و تێناگەن.

(٦٢) ئایا کێیە جگە لە زاتی پەروەرگار کە بێت بە هانا و هاواری لێقەوماو و بێدەرەتان و بێدادەوە، کاتێک نزا دەکات و لێی دەپاڕێتەوە، ئەوسا بەڵاو ناخۆشیەکان لادەبات و دەتانکاتە نیشتەجێ و جێنشین لە زەویدا، ئایا رەوایە لەگەڵ ئەو زاتەدا خوای تر هەبێت؟! کەمێک یاداوەری وەربگرن و تێفکرن و بیربکەنەوە.

(٦٣) ئایا کێ لە تاریکستانی سەر وشکانی و دەریا رێنموییتان دەکات تا ون نەبن؟! کێ بای شەماڵ (هەڵگری هەڵمی ئاو) دەنێرێت وەک مژدەیەک پێش گەیشتنی بارانی رەحمەت؟، ئایا رەوایە لەگەڵ خوادا خوای تر هەبێت، بەرزی و بڵندی و مەزنی بۆ خوای گەورە لەبەرامبەر ئەو شتانەوە کە نەفامان دەیکەنە هاوەڵ و شەریک بۆ ئەو زاتە.

أَمَّن يَبْدَؤُا الْخَلْقَ ثُمَّ يُعِيدُهُ وَمَن يَرْزُقُكُم مِّنَ السَّمَآءِ وَالْأَرْضِ أَءِلَٰهٌ مَّعَ اللَّهِ قُلْ هَاتُوا بُرْهَانَكُمْ إِن كُنتُمْ صَادِقِينَ ﴿٦٤﴾ قُل لَّا يَعْلَمُ مَن فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ الْغَيْبَ إِلَّا اللَّهُ وَمَا يَشْعُرُونَ أَيَّانَ يُبْعَثُونَ ﴿٦٥﴾ بَلِ ادَّارَكَ عِلْمُهُمْ فِي الْآخِرَةِ بَلْ هُمْ فِي شَكٍّ مِّنْهَا بَلْ هُم مِّنْهَا عَمُونَ ﴿٦٦﴾ وَقَالَ الَّذِينَ كَفَرُوا أَءِذَا كُنَّا تُرَابًا وَآبَاؤُنَا أَئِنَّا لَمُخْرَجُونَ ﴿٦٧﴾ لَقَدْ وُعِدْنَا هَٰذَا نَحْنُ وَآبَاؤُنَا مِن قَبْلُ إِنْ هَٰذَا إِلَّا أَسَاطِيرُ الْأَوَّلِينَ ﴿٦٨﴾ قُلْ سِيرُوا فِي الْأَرْضِ فَانظُرُوا كَيْفَ كَانَ عَاقِبَةُ الْمُجْرِمِينَ ﴿٦٩﴾ وَلَا تَحْزَنْ عَلَيْهِمْ وَلَا تَكُن فِي ضَيْقٍ مِّمَّا يَمْكُرُونَ ﴿٧٠﴾ وَيَقُولُونَ مَتَىٰ هَٰذَا الْوَعْدُ إِن كُنتُمْ صَادِقِينَ ﴿٧١﴾ قُلْ عَسَىٰ أَن يَكُونَ رَدِفَ لَكُم بَعْضُ الَّذِي تَسْتَعْجِلُونَ ﴿٧٢﴾ وَإِنَّ رَبَّكَ لَذُو فَضْلٍ عَلَى النَّاسِ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَهُمْ لَا يَشْكُرُونَ ﴿٧٣﴾ وَإِنَّ رَبَّكَ لَيَعْلَمُ مَا تُكِنُّ صُدُورُهُمْ وَمَا يُعْلِنُونَ ﴿٧٤﴾ وَمَا مِنْ غَائِبَةٍ فِي السَّمَآءِ وَالْأَرْضِ إِلَّا فِي كِتَابٍ مُّبِينٍ ﴿٧٥﴾ إِنَّ هَٰذَا الْقُرْآنَ يَقُصُّ عَلَىٰ بَنِي إِسْرَآءِيلَ أَكْثَرَ الَّذِي هُمْ فِيهِ يَخْتَلِفُونَ ﴿٧٦﴾

(٦٤) ئایا کێ لە سەرەتاوە دروستکراوان بەدی دەهێنێت، پاشان دوای تێکدانی سەرلەنوێ دروستی دەکاتەوە، کێ لەو ئاسمانەوە (بەهۆی تیشکی خۆرو باران و هەواوە) لە زەویەوە (بەهۆی خاکەوە) رزق و رۆزیتان پێ دەبەخشێت؟، ئایا رەوایە لەگەڵ زاتی خوادا خوای تر هەبێت؟، پێیان بڵێ: ئادەی بەڵگەتان چیە بیهێننە مەیدان ئەگەر ئێوە راستگۆن .

(٦٥) (ئەی پێغەمبەر ﷺ پێیان) بڵێ: جگە لەخوا هەرچی لە ئاسمانەکان و زەویدا هەیە هیچیان ئاگادارنین لە پەنهان و شاراوەکان، هەستیش ناکەن کەی زیندوو دەکرێنەوە...

(٦٦) نەخێر، ئەوانە زانیاری و زانستیان دەربارەی قیامەت کۆتا و کەم و کورتە، بەڵکو ئەوان لە گوماندان دەربارەی، بەڵکو هەر کوێرن لەئاستیدا و دڵیان نابینایە.

(٦٧) ئەوانەی بێ باوەڕ بوون دەیانوت: باشە ئەگەر ئێمە بووینە خاک لەگەڵ باوو باپیرانماندا، ئایا ئێمە (بۆ ژیانێکی نوێ) دەردەهێنرێینەوە ؟!

(٦٨) سوێند بە خوا بەراستی ئێمە پێشتر لەم بەڵێنانەمان پێدراوە لەگەڵ باوو باپیرانماندا ئەمە هیچ شتێک نیە، تەنها داستان و قسەی پێشینەکانە!!

(٦٩) پێیان بڵێ: دە بگەڕێن بەسەر زەویدا و سەرنج بدەن و بزانن چۆن بوو سەرئەنجامی تاوانبار و تاوانکاران.

(٧٠) تۆش خەفەت مەخۆ بۆیان و غەمگین مەبە لەو پیلان و تەڵەکە و فێڵانەی کە ئەنجامی دەدەن.

(٧١) خوانەناسان دەڵێن: کەی ئەم بەڵێنە پێش دێت ئەگەر ئێوە راست دەکەن؟

(٧٢) پێیان بڵێ: دوور نیە بەشێک لەو سزایەی کە ئێوە پەلەی لێ دەکەن، بەم زووانە بۆتان پێش بێت.

(٧٣) ئەی محمد ﷺ بەراستی پەروەردگاری تۆ خاوەنی فەزڵ و بەخشندەییە بەسەر خەڵکیەوە، بەڵام زۆربەیان سپڵەن و سوپاسی خوا ناکەن.

(٧٤) بێگومان پەروەردگارت چاک دەزانێت چی لە سینەیاندا حەشاردەدەن و چیش ئاشکرا دەکەن.

(٧٥) هیچ شتێک لە خوا پەنهان نیە لە ئاسماندا بێت یان لە زەویدا، لە دۆسیەی ئاشکرادا تۆمار نەکرابێت.

(٧٦) بەراستی ئەم قورئانە زۆربەی زۆری ئەو شتانەی کە نەوەی ئیسرائیل جیاوازی و کێشەیان لە سەری هەیە باسی دەکات و لێی دەدوێت و روونی دەکاتەوە.

وَإِنَّهُۥ لَهُدًى وَرَحْمَةٌ لِّلْمُؤْمِنِينَ ﴿٧٧﴾ إِنَّ رَبَّكَ يَقْضِي بَيْنَهُم بِحُكْمِهِۦ ۚ وَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْعَلِيمُ ﴿٧٨﴾ فَتَوَكَّلْ عَلَى ٱللَّهِ ۖ إِنَّكَ عَلَى ٱلْحَقِّ ٱلْمُبِينِ ﴿٧٩﴾ إِنَّكَ لَا تُسْمِعُ ٱلْمَوْتَىٰ وَلَا تُسْمِعُ ٱلصُّمَّ ٱلدُّعَآءَ إِذَا وَلَّوْا۟ مُدْبِرِينَ ﴿٨٠﴾ وَمَآ أَنتَ بِهَٰدِى ٱلْعُمْىِ عَن ضَلَٰلَتِهِمْ ۖ إِن تُسْمِعُ إِلَّا مَن يُؤْمِنُ بِـَٔايَٰتِنَا فَهُم مُّسْلِمُونَ ﴿٨١﴾ ۞ وَإِذَا وَقَعَ ٱلْقَوْلُ عَلَيْهِمْ أَخْرَجْنَا لَهُمْ دَآبَّةً مِّنَ ٱلْأَرْضِ تُكَلِّمُهُمْ أَنَّ ٱلنَّاسَ كَانُوا۟ بِـَٔايَٰتِنَا لَا يُوقِنُونَ ﴿٨٢﴾ وَيَوْمَ نَحْشُرُ مِن كُلِّ أُمَّةٍ فَوْجًا مِّمَّن يُكَذِّبُ بِـَٔايَٰتِنَا فَهُمْ يُوزَعُونَ ﴿٨٣﴾ حَتَّىٰٓ إِذَا جَآءُو قَالَ أَكَذَّبْتُم بِـَٔايَٰتِى وَلَمْ تُحِيطُوا۟ بِهَا عِلْمًا أَمَّاذَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴿٨٤﴾ وَوَقَعَ ٱلْقَوْلُ عَلَيْهِم بِمَا ظَلَمُوا۟ فَهُمْ لَا يَنطِقُونَ ﴿٨٥﴾ أَلَمْ يَرَوْا۟ أَنَّا جَعَلْنَا ٱلَّيْلَ لِيَسْكُنُوا۟ فِيهِ وَٱلنَّهَارَ مُبْصِرًا ۚ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَٰتٍ لِّقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ ﴿٨٦﴾ وَيَوْمَ يُنفَخُ فِى ٱلصُّورِ فَفَزِعَ مَن فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَن فِى ٱلْأَرْضِ إِلَّا مَن شَآءَ ٱللَّهُ ۚ وَكُلٌّ أَتَوْهُ دَٰخِرِينَ ﴿٨٧﴾ وَتَرَى ٱلْجِبَالَ تَحْسَبُهَا جَامِدَةً وَهِىَ تَمُرُّ مَرَّ ٱلسَّحَابِ ۚ صُنْعَ ٱللَّهِ ٱلَّذِىٓ أَتْقَنَ كُلَّ شَىْءٍ ۚ إِنَّهُۥ خَبِيرٌۢ بِمَا تَفْعَلُونَ ﴿٨٨﴾



(٧٧) هەروەها بەڕاستی ئەم قورئانە هۆی هیدایەت و ڕێنمووییی و ڕەحمەت و میهرەبانیە بۆ ئیمانداران.

بەڕاستی پەروەردگارت داوەریی دەکات لە نێوانیاندا بەدەسەلاَت و فەرمانی خۆی، هەر ئەویش زاتێکی باڵادەست و زانایە.

(٧٩) (ئەی پێغەمبەر ، ئەی ئیماندار) کەواتە تۆ پشت بەخوا ببەستە، بەڕاستی تۆ لەسەر حەق و ڕاستیەکی ئاشکرایت.

بێگومان تۆ ناتوانیت ئەم بانگەوازە بخەیتە ناو دڵی دڵ مردوو و کەڕەواڵەکانەوە، بەتایبەت کاتێک ڕوو وەردەگێڕن و پشت هەڵدەکەن (بڕیاری داخستنی دڵ و گوێیان دەدەن).

هەروەها تۆ ناتوانیت هیدایەت و ڕێنمووییی کوێرو نابیناکان بکەیت و لەتاریکی ڕزگاریان بکەیت (ئەوانەی دڵیان کوێرەو سەرنجی ڕاستیەکان نادەن)، تۆ تەنها دەتوانیت (ئەم ڕاستیانە) بدەیت بەگوێی ئەو کەسانەدا کە باوەڕیان بەئایەت و فەرمانەکانی ئێمەدەهێنن (لە قورئان و بوونەوەردا) چونکە ئەوانە هەمیشە ملکەچی فەرمانەکانی خوای گەورەن.

کاتێک بڕیاری بەرپابوونی (قیامەت درا، یاخود نزیک بووە)، زیندەوەرێک لە زەوی دەردەهێنین بۆیان کە قسەیان بۆ دەکات کە: بەڕاستی زۆربەی خەڵکی باوەڕیان بە ئایەت و فەرمانەکانی ئێمە نەبووە.

(٨٣) ڕۆژێک دێت لە هەر ئوممەتێک دەستەیەک کێش دەکەین و کۆیان دەکەینەوە، لەوانەی کە ئایەتەکانی ئێمەیان بەدرۆ دەزانن، ئینجا بەرودوا هەموویان کۆدەکرێنەوە.

(٨٤) هەتا ئەوکاتەی دێنە پێشەوە بۆ لێپرسینەوە، خوا دەفەرموێت: ئایا ئەوە ئێوە بڕواتان بەئایەتەکانی من نەهێنا لە کاتێکدا ئێوە هیچ زانستی و زانیاریەکتان دەربارەی نەبوو؟ یاخود ئێوە خەریکی چی بوون؟ چیتان دەکرد بەئایەتەکانی ئێمە؟

(٨٥) سەرئەنجام بڕیارو فەرمانی خوا دەرچوو دژیان بەهۆی ئەوستەمەی کردیان، جا قسەیان بۆ ناکرێت و ورتەیان لێنایەت.

(٨٦) ئایا ئەو خەڵکە نەیانبینیوە کە بەڕاستی ئێمە شەومان تاریک کردووە، تا تیایدا بحەسێنەوە، ڕۆژیشمان ڕووناک کردۆتەوە، تا هەموو شت ببینن، بەڕاستی ئا لەو دیاردانەدا بەڵگە و نیشانەی زۆر هەیە بۆ کەسانێک ئیمان و باوەڕ بهێنن.

(٨٧) یادی ڕۆژێک بکە فوو دەکرێت بە ـ صور ـ دا، هەرکەس لە ئاسمانەکان و هەرکەس لە زەویدا هەیە، ترس و بیمێکی زۆر دایدەگرێت، جگە لەوانەی کە ویستی خوا وایە ترس و بیمیان نەبێت، هەموانیش دێن بەملکەچی و ناچاریی.

(٨٨) تۆ کێوەکان دەبینیت وا دەزانیت کە وەستاون و بێجووڵەن، لەکاتێکدا کە ئەوانیش وەکو هەور لە جووڵەدان (چونکە زەوی بەخێرایی هەزار کیلۆمەتر لە سەعاتێکدا بەدەوری خۆیدا دەسوڕێتەوە، هەروەها لەسەرەتای بەرپابوونی قیامەتدا کێوەکان وەکو خوری شی کراوە دەبرێن بە ئاسمانداو چاڵ و چۆڵی زەویان پێ پڕدەکرێتەوە)، ئەمەیە دەستکردی ئەوخوایەی کەهەموو شتێکی بەوپەڕی ڕێکوپێکی دروستکردووە، بەڕاستی ئەوزاتە زۆر ئاگایە بەو کاروکردەوانەی کە ئەنجامی دەدەن.

مَن جَآءَ بِٱلۡحَسَنَةِ فَلَهُۥ خَيۡرٞ مِّنۡهَا وَهُم مِّن فَزَعٖ يَوۡمَئِذٍ ءَامِنُونَ ﴿٨٩﴾ وَمَن جَآءَ بِٱلسَّيِّئَةِ فَكُبَّتۡ وُجُوهُهُمۡ فِي ٱلنَّارِ هَلۡ تُجۡزَوۡنَ إِلَّا مَا كُنتُمۡ تَعۡمَلُونَ ﴿٩٠﴾ إِنَّمَآ أُمِرۡتُ أَنۡ أَعۡبُدَ رَبَّ هَٰذِهِ ٱلۡبَلۡدَةِ ٱلَّذِي حَرَّمَهَا وَلَهُۥ كُلُّ شَيۡءٖۖ وَأُمِرۡتُ أَنۡ أَكُونَ مِنَ ٱلۡمُسۡلِمِينَ ﴿٩١﴾ وَأَنۡ أَتۡلُوَاْ ٱلۡقُرۡءَانَۖ فَمَنِ ٱهۡتَدَىٰ فَإِنَّمَا يَهۡتَدِي لِنَفۡسِهِۦۖ وَمَن ضَلَّ فَقُلۡ إِنَّمَآ أَنَا۠ مِنَ ٱلۡمُنذِرِينَ ﴿٩٢﴾ وَقُلِ ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ سَيُرِيكُمۡ ءَايَٰتِهِۦ فَتَعۡرِفُونَهَاۚ وَمَا رَبُّكَ بِغَٰفِلٍ عَمَّا تَعۡمَلُونَ ﴿٩٣﴾

سُورَةُ القَصَصِ

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

طسٓمٓ ﴿١﴾ تِلۡكَ ءَايَٰتُ ٱلۡكِتَٰبِ ٱلۡمُبِينِ ﴿٢﴾ نَتۡلُواْ عَلَيۡكَ مِن نَّبَإِ مُوسَىٰ وَفِرۡعَوۡنَ بِٱلۡحَقِّ لِقَوۡمٖ يُؤۡمِنُونَ ﴿٣﴾ إِنَّ فِرۡعَوۡنَ عَلَا فِي ٱلۡأَرۡضِ وَجَعَلَ أَهۡلَهَا شِيَعٗا يَسۡتَضۡعِفُ طَآئِفَةٗ مِّنۡهُمۡ يُذَبِّحُ أَبۡنَآءَهُمۡ وَيَسۡتَحۡيِۦ نِسَآءَهُمۡۚ إِنَّهُۥ كَانَ مِنَ ٱلۡمُفۡسِدِينَ ﴿٤﴾ وَنُرِيدُ أَن نَّمُنَّ عَلَى ٱلَّذِينَ ٱسۡتُضۡعِفُواْ فِي ٱلۡأَرۡضِ وَنَجۡعَلَهُمۡ أَئِمَّةٗ وَنَجۡعَلَهُمُ ٱلۡوَٰرِثِينَ ﴿٥﴾

(٨٩) کەسێک بە کارو کردەوەی چاکەوە بێت، ئەوە پاداشتی چاکتر لەوەی خۆی پێشکەش دەکرێت و ئەوانە لەو ڕۆژەدا لە ترس و بیم پارێزراون و ئاسوودە و ئارامن.

(٩٠) ئەوەش بە تاوان و گوناهو خراپەوە دێت، بە ڕوودا و سەرەو خوار دەخرێتە ناو ئاگری دۆزەخەوە و (پێیان دەوترێت): ئایا پاداشتان دەدرێتەوە جگە لەوەی دەتانکرد ؟!

(٩١) (ئەی پێغەمبەر ﷺ پێیان بڵێ): بەڕاستی من تەنها فەرمانی ئەوەم پێدراوە خوای ئەم شارەو ئەم شوێنە بپەرستم کە حورمەتی بۆ داناوەو هەموو شت ئەو خاوەنیەتی، فەرمانیشم پێدراوە لە فەرمانبەردارو موسڵمانەکان بم.

(٩٢) (فەرمانیشم پێدراوە کە): قورئان دەور بکەمەوە و بەردەوام بیخوێنمەوە، جا ئەوەی ڕێبازی هیدایەت وەربگرێت، ئەوە بەڕاستی قازانجی وەرگرتنی ڕێنموماییەکەی هەر بۆ خۆیەتی (لەدنیاو قیامەتدا سوودی لێوەردەگرێت) ، ئەوەش کە گومڕا دەبێت، تۆ پێی بڵێ: (من زۆرم لەسەرتان نیە) بێگومان من تەنها یەکێکم لە بێدارکەرەوەکان.

(٩٣) بڵێ (الحمد لله) سوپاس و ستایش بۆ خوا، لەئایندەیەکی نزیکدا هەموو بەڵگە و نیشانەکانی خۆیتان نیشان دەدات و دەیانناسنەوە (کە هەمووی دەستکار و بەدیهێنراوی خوایە) ، بێگومان پەروەردگاری تۆ غافڵ و بێئاگا نیە لەو کارو کردەوانەی کە ئەنجامی دەدەن.

سورەتی (القصص)

بەناوی خوای بەخشندە و میهرەبان

(١) سەرنجی سەرەتای سوورەتی (البقرة) بدە.

(٢) ئەوە چەند ئایەتێکە لە ئایەتەکانی ئەم قورئانە ڕوون و ئاشکرایە.

(٣) ئێمە هەندێک لە هەواڵ و بەسەرهاتی گرنگی ڕاست و نەگۆڕی موسا و فیرعەون دەخوێنینەوە بەسەرتدا، بۆ ئەوەی سوود بگەیەنین بە گەلێک کە بڕوا دەهێنن (تا ببێتە پەندو ئامۆژگاری).

(٤) بێگومان فیرعەون زاڵ و دڕندە بوو لە وڵاتەکەیدا، خەڵکەکەی پارچە پارچە کرد (جیاوازی خستە نێوانیانەوە)، دەستەیەکیانی دەچەوساندەوە و لاوازی دەکردن، منداڵە نێرینەکانی سەردەبڕین، کچان و ئافرەتانی (بەزەلیلی دەهێشتەوە)، بەڕاستی ئەو ستەمکارە یەکێک بوو لەوانەی تۆوی خراپەی دەچاند.

(٥) ئێمەش دەمانەوێت دەروو بکەینەوە لە چەوساوەکان و منەتی خێر بکەین بەسەر لاوازکراوەکاندا لە وڵاتداو دەمانەوێت بیانکەینە پێشەواو بیانکەینە میراتگری سامان و دەسەڵاتی ستەمکاران.

وَنُمَكِّنَ لَهُمْ فِي ٱلْأَرْضِ وَنُرِيَ فِرْعَوْنَ وَهَٰمَٰنَ وَجُنُودَهُمَا مِنْهُم مَّا كَانُوا۟ يَحْذَرُونَ ﴿٦﴾ وَأَوْحَيْنَآ إِلَىٰٓ أُمِّ مُوسَىٰٓ أَنْ أَرْضِعِيهِ ۖ فَإِذَا خِفْتِ عَلَيْهِ فَأَلْقِيهِ فِي ٱلْيَمِّ وَلَا تَخَافِي وَلَا تَحْزَنِيٓ ۖ إِنَّا رَآدُّوهُ إِلَيْكِ وَجَاعِلُوهُ مِنَ ٱلْمُرْسَلِينَ ﴿٧﴾ فَٱلْتَقَطَهُۥٓ ءَالُ فِرْعَوْنَ لِيَكُونَ لَهُمْ عَدُوًّا وَحَزَنًا ۗ إِنَّ فِرْعَوْنَ وَهَٰمَٰنَ وَجُنُودَهُمَا كَانُوا۟ خَٰطِـِٔينَ ﴿٨﴾ وَقَالَتِ ٱمْرَأَتُ فِرْعَوْنَ قُرَّتُ عَيْنٍ لِّي وَلَكَ ۖ لَا تَقْتُلُوهُ عَسَىٰٓ أَن يَنفَعَنَآ أَوْ نَتَّخِذَهُۥ وَلَدًا وَهُمْ لَا يَشْعُرُونَ ﴿٩﴾ وَأَصْبَحَ فُؤَادُ أُمِّ مُوسَىٰ فَٰرِغًا ۖ إِن كَادَتْ لَتُبْدِي بِهِۦ لَوْلَآ أَن رَّبَطْنَا عَلَىٰ قَلْبِهَا لِتَكُونَ مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴿١٠﴾ وَقَالَتْ لِأُخْتِهِۦ قُصِّيهِ ۖ فَبَصُرَتْ بِهِۦ عَن جُنُبٍ وَهُمْ لَا يَشْعُرُونَ ﴿١١﴾ ۞ وَحَرَّمْنَا عَلَيْهِ ٱلْمَرَاضِعَ مِن قَبْلُ فَقَالَتْ هَلْ أَدُلُّكُمْ عَلَىٰٓ أَهْلِ بَيْتٍ يَكْفُلُونَهُۥ لَكُمْ وَهُمْ لَهُۥ نَٰصِحُونَ ﴿١٢﴾ فَرَدَدْنَٰهُ إِلَىٰٓ أُمِّهِۦ كَيْ تَقَرَّ عَيْنُهَا وَلَا تَحْزَنَ وَلِتَعْلَمَ أَنَّ وَعْدَ ٱللَّهِ حَقٌّ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَهُمْ لَا يَعْلَمُونَ ﴿١٣﴾



(٦) هەروەها دەمانەوێت پایەداریان بکەین و دەسەڵاتیان بچەسپێنین لە وڵاتداو، ئەوە پێش بهێنین بۆ فیرعەون و هامان و سەربازانیان کە لێی دەترسان (ئەم بەڵێنە خواییە بەویستی پەروەردگاری باڵادەست دووبارە دەبێتەوە بۆ ئیمانداران لە بارودۆخی تایبەتی و گونجاودا).

(٧) ئێمە دایکی موسامان ئاگادارکرد، کە شیری بداتێ و (پێمان وت) جا کاتێک مەترسیت پەیدا کرد لەوەی کە پێی بزانرێت فرێی بدەرە رووباری (نیلەوە)، نە بترسە (لەوەی تووشی بەڵا ببێت) نە خەفەتیشی بۆ بخۆ، چونکە ئێمە بەڕاستی دەیگێڕینەوە بۆ لات و لەئایندەشدا دەیکەین بەیەکێک لە پێغەمبەرە پەیامدارەکان.

(٨) ئەوسا ئیتر دارو دەستەی فیرعەون هەڵیان گرتەوە، تا سەرەنجام ببێتە دوژمن و خەفەت بۆیان، بەڕاستی فیرعەون و هامان و سەربازەکانیان گوناهکارو تاوانبارو هەڵە بوون.

(٩) (کاتێک فیرعەون موسای ساوای بینی فەرمانی کوشتنی دەرکرد) خێزانەکەی نەیهێشت و وتی: هیوادارم ببێتە مایەی خۆشحاڵی و چاوروونی بۆ منیش و بۆ تۆش، مەیکوژن، بەڵکو لەئایندەدا سوودمان پێ بگەیەنێت یان دەیکەینە کوڕی خۆمان، لەکاتێکدا ئەوان هەر پێی نازانن و هەستی پێ ناکەن.

(١٠) ئەوسا دایکی موسا هەستی بەبێتاقەتی و بە بۆشاییەکی زۆر دەکرد لەدڵ و دەروونی خۆیدا، بەڕاستی خەریک بوو رازەکە ئاشکرا بکات، ئەگەر ئێمە دڵیمان دامەزراو نەکردایە تا لەو کەسانە بێت کە بڕوایان بە بەڵێنی خوا هەیە.

(١١) پاشان بەخوشکەکەی موسای وت: بڕۆ بە شوێنیدا، (دوای تاوێک) لە کەنارێکەوە (موسای بەباوەشی ئافرەتێکەوە) بینیی، ئەوان هەستیان بەوە نەکرد (کە خوشکەکەی چاودێری دەکات).

(١٢) ئێمە پێشتر هەرچی ئافرەتی شیردەرە لەومان حەرام کرد، خوشکەکەی (بەمەی زانی حەکیمانە لە کۆشک نزیک بۆوە) وتی: ئایا ناونیشانی ماڵێکتان پێ بڵێم کە ئەو منداڵەتان بۆ بەخێو بکەن، دڵسۆزو میهرەبانیش بن بۆی.

(١٣) بەو شێوەیە گێڕامانەوە بۆ لای دایکی تا دڵنیاو دڵ ئارام بێت و چاوی بەدیتنی ئاسوودە ببێت ئیتر خەفەت نەخوات و لای روون بێت کە بەڵێنی خوا حەق و راستە، بەڵام زۆربەی (ئەو خەڵکە) نازانن و هەستی پێ ناکەن.

وَلَمَّا بَلَغَ أَشُدَّهُۥ وَٱسْتَوَىٰٓ ءَاتَيْنَٰهُ حُكْمًا وَعِلْمًا ۚ وَكَذَٰلِكَ نَجْزِى ٱلْمُحْسِنِينَ ﴿١٤﴾ وَدَخَلَ ٱلْمَدِينَةَ عَلَىٰ حِينِ غَفْلَةٍ مِّنْ أَهْلِهَا فَوَجَدَ فِيهَا رَجُلَيْنِ يَقْتَتِلَانِ هَٰذَا مِن شِيعَتِهِۦ وَهَٰذَا مِنْ عَدُوِّهِۦ ۖ فَٱسْتَغَٰثَهُ ٱلَّذِى مِن شِيعَتِهِۦ عَلَى ٱلَّذِى مِنْ عَدُوِّهِۦ فَوَكَزَهُۥ مُوسَىٰ فَقَضَىٰ عَلَيْهِ ۖ قَالَ هَٰذَا مِنْ عَمَلِ ٱلشَّيْطَٰنِ ۖ إِنَّهُۥ عَدُوٌّ مُّضِلٌّ مُّبِينٌ ﴿١٥﴾ قَالَ رَبِّ إِنِّى ظَلَمْتُ نَفْسِى فَٱغْفِرْ لِى فَغَفَرَ لَهُۥٓ ۚ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلْغَفُورُ ٱلرَّحِيمُ ﴿١٦﴾ قَالَ رَبِّ بِمَآ أَنْعَمْتَ عَلَىَّ فَلَنْ أَكُونَ ظَهِيرًا لِّلْمُجْرِمِينَ ﴿١٧﴾ فَأَصْبَحَ فِى ٱلْمَدِينَةِ خَآئِفًا يَتَرَقَّبُ فَإِذَا ٱلَّذِى ٱسْتَنصَرَهُۥ بِٱلْأَمْسِ يَسْتَصْرِخُهُۥ ۚ قَالَ لَهُۥ مُوسَىٰٓ إِنَّكَ لَغَوِىٌّ مُّبِينٌ ﴿١٨﴾ فَلَمَّآ أَنْ أَرَادَ أَن يَبْطِشَ بِٱلَّذِى هُوَ عَدُوٌّ لَّهُمَا قَالَ يَٰمُوسَىٰٓ أَتُرِيدُ أَن تَقْتُلَنِى كَمَا قَتَلْتَ نَفْسًۢا بِٱلْأَمْسِ ۖ إِن تُرِيدُ إِلَّآ أَن تَكُونَ جَبَّارًا فِى ٱلْأَرْضِ وَمَا تُرِيدُ أَن تَكُونَ مِنَ ٱلْمُصْلِحِينَ ﴿١٩﴾ وَجَآءَ رَجُلٌ مِّنْ أَقْصَا ٱلْمَدِينَةِ يَسْعَىٰ قَالَ يَٰمُوسَىٰٓ إِنَّ ٱلْمَلَأَ يَأْتَمِرُونَ بِكَ لِيَقْتُلُوكَ فَٱخْرُجْ إِنِّى لَكَ مِنَ ٱلنَّٰصِحِينَ ﴿٢٠﴾ فَخَرَجَ مِنْهَا خَآئِفًا يَتَرَقَّبُ ۖ قَالَ رَبِّ نَجِّنِى مِنَ ٱلْقَوْمِ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٢١﴾

(١٤) (دوای چەند ساڵ) کاتێک تەمەنی گەیشتە ئەوپەڕی هێزو توانایی، ئێمەش حیکمەت و دانایی و زانیاریمان پێبەخشی، هەر بەو شێوەیە پاداشتی چاکەکاران دەدەینەوە.

(١٥) (موسا) لەکاتی غەفڵەتی خەڵکی شاردا خۆی کرد بە شەقام و بازاڕدا، بینی دوو پیاو شەڕ دەکەن، ئەمەیان لە تایەفەی خۆیەتی و ئەمەشیان لە دەستەی دوژمنەکەیەتی(سەربازی فیرعەونە)، ئەوەی خزمی خۆی بوو موسای بینی هاواری لێکرد کە فریای بکەوێت و زاڵی بکات بەسەر دوژمنەکەیدا، موساش بەپەلە چوو بەدەمیەوە بۆکزێکی ماڵی بە کابرای (قبطـي دا)و کوشتی، موسا پەشیمان بۆوە لەبەرخۆیەوە وتی: ئەم کارە شەیتان پێی کردم (من نەمدەویست بیکوژم) بە راستی شەیتان دوژمنێکی گومڕاکەری ئاشکرایە.

(١٦) (ئینجا دەستەکانی بەرز کردەوە و) وتی: پەروەردگارا من بەڕاستی ستەمم لەخۆم کرد کاتێک لە دەستم دەرچوو ئەو کابرایەم کوشت، لێم ببوورە و بمبەخشە، جاخوای میهرەبانیش لێی خۆشبوو، بێگومان ئەو زاتێکی لێخۆشبوو میهرەبانە.

(١٧) (موسا هەستی کرد پەروەردگاری نزای گیرا کردووە بۆیە) وتی: پەروەردگارا مادەم ئاوا نازو نیعمەتی لێخۆش بوونت بەسەردا رژاندم، من ئیتر هەرگیز نابمە پشتیوان بۆ تاوانکاران.

(١٨) بەهۆی ئەوەوە ترس و بیم دایگرت و بەشاردا دەسوڕایەوەو چاودێری دەکرد، کوتوپڕ کابرای کە دوێنێ فریای کەوت، هاواری لێکرد فریام بکەوە! موسا چوو بە هاواریەوە و پێی وت: بەڕاستی تۆ کابرایەکی شەڕەنگێز و گێچەڵ گێڕی ئاشکرایت.

(١٩) کاتێک موسا ویستی هێرش بکاتە سەر ئەوەی کە دوژمنی هەردووکیانە (واتە قبطیەکە، کابرا) وتی: ئەی موسا دەتەوێت منیش بکوژیت وەک ئەو کەسەی دوێنێ کوشتت، دیارە تۆ هەر دەتەوێت ببیتە زۆردار لە زەویداو ناتەوێت بچیتە ریزی ئەو کەسانەوە کە چاکەکارن.

(٢٠) (دوای ماوەیەک) لەوپەڕی شارەوە پیاوێکی (ئیماندار کە لە خزمانی فیرعەون بوو) بە پەلە هات و وتی: ئەی موسا (فریای خۆت بکەوە) بەڕاستی دارو دەستەی فیرعەون دانیشتوون و نەخشە دەکێشن تا بتکوژن، تا زووە دەرچۆ و ئێرە بەجێ بهێڵە، بێگومان من لە دڵسۆزانم بۆ تۆ.

(٢١) موسا لە شار دەرچوو بەترس و بیمەوە، هەر سەیری ئەملاو ئەولای خۆی دەکرد، لەبەر خۆیەوە دەیوت: پەروەردگارا لە دەست قەومی ستەمکار رزگارم بکە.

وَلَمَّا تَوَجَّهَ تِلْقَآءَ مَدْيَنَ قَالَ عَسَىٰ رَبِّىٓ أَن يَهْدِيَنِى سَوَآءَ ٱلسَّبِيلِ ﴿٢٢﴾ وَلَمَّا وَرَدَ مَآءَ مَدْيَنَ وَجَدَ عَلَيْهِ أُمَّةً مِّنَ ٱلنَّاسِ يَسْقُونَ وَوَجَدَ مِن دُونِهِمُ ٱمْرَأَتَيْنِ تَذُودَانِ قَالَ مَا خَطْبُكُمَا قَالَتَا لَا نَسْقِى حَتَّىٰ يُصْدِرَ ٱلرِّعَآءُ وَأَبُونَا شَيْخٌ كَبِيرٌ ﴿٢٣﴾ فَسَقَىٰ لَهُمَا ثُمَّ تَوَلَّىٰٓ إِلَى ٱلظِّلِّ فَقَالَ رَبِّ إِنِّى لِمَآ أَنزَلْتَ إِلَىَّ مِنْ خَيْرٍ فَقِيرٌ ﴿٢٤﴾ فَجَآءَتْهُ إِحْدَىٰهُمَا تَمْشِى عَلَى ٱسْتِحْيَآءٍ قَالَتْ إِنَّ أَبِى يَدْعُوكَ لِيَجْزِيَكَ أَجْرَ مَا سَقَيْتَ لَنَا ۚ فَلَمَّا جَآءَهُۥ وَقَصَّ عَلَيْهِ ٱلْقَصَصَ قَالَ لَا تَخَفْ ۖ نَجَوْتَ مِنَ ٱلْقَوْمِ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٢٥﴾ قَالَتْ إِحْدَىٰهُمَا يَٰٓأَبَتِ ٱسْتَـْٔجِرْهُ ۖ إِنَّ خَيْرَ مَنِ ٱسْتَـْٔجَرْتَ ٱلْقَوِىُّ ٱلْأَمِينُ ﴿٢٦﴾ قَالَ إِنِّىٓ أُرِيدُ أَنْ أُنكِحَكَ إِحْدَى ٱبْنَتَىَّ هَٰتَيْنِ عَلَىٰٓ أَن تَأْجُرَنِى ثَمَٰنِىَ حِجَجٍ ۖ فَإِنْ أَتْمَمْتَ عَشْرًا فَمِنْ عِندِكَ ۖ وَمَآ أُرِيدُ أَنْ أَشُقَّ عَلَيْكَ ۚ سَتَجِدُنِىٓ إِن شَآءَ ٱللَّهُ مِنَ ٱلصَّٰلِحِينَ ﴿٢٧﴾ قَالَ ذَٰلِكَ بَيْنِى وَبَيْنَكَ ۖ أَيَّمَا ٱلْأَجَلَيْنِ قَضَيْتُ فَلَا عُدْوَٰنَ عَلَىَّ ۖ وَٱللَّهُ عَلَىٰ مَا نَقُولُ وَكِيلٌ ﴿٢٨﴾

(٢٢) کاتێک ڕووی کردە شاری مەدیەن (دووبارە ڕووی کردە پەروەردگاری و) وتی: ئومێدەوارم کە پەروەردگارم ڕێنموویم بکات بۆ شوێن و جێگەیەکی ڕاست و دروست (دوور لە کێشە و ناخۆشی).

(٢٣) کاتێک گەیشتە ئاوەکەی مەدیەن، خەڵکێکی بینی ماڵاتەکانیان ئاودەدا، لەولاشەوە دوو ئافرەتی بینی کە بەخۆیان و مەڕەکانیانەوە دوورەپەرێز وەستا بوون، بۆیە لێیان چووە پێشەوە و پرسی و وتی: ئەوە ئێوە بۆچی لێرە وەستاون؟ کێشەتان چیە وادوورە پەرێزن؟ ئافرەتەکان وتیان: ئێمە ناتوانین ماڵاتەکەمان ئاوبدەین، هەتا شوانەکان نەڕۆن و چۆڵی نەکەن، باوکیشمان پیرەمێردێکی بەساڵاچووە.

(٢٤) موسا مەردانە، شوانەکانی بەڕدا و ماڵاتەکەیانی ئاودا و بەڕێی کردن، دوایی پشتی تێکردن و چووە ژێر سێبەرەکە و نزای کردو وتی: پەروەردگارا بەڕاستی تۆ خێرو بێری زۆرت بەسەردا ڕژاندووم، بەڵام هێشتا هەژارم و ئاتاجی بەخششی زیاترم.

(٢٥) دوای تاوێک یەکێک لە کچەکان هات بۆ لای موسا زۆر بەشەرم و حەیاوە دەڕۆیشت بە ڕێگەدا، کە گەیشتە لای پێی وت: باوکم بانگت دەکات و حەز دەکات پاداشتی ئەو چاکە و ئاودانی ماڵاتە کە بۆ ئێمەت ئەنجامدا، بداتەوە....، کاتێک موسا گەیشتە لای باوکیان، دوای حەوانەوە هەموو بەسەرهاتەکەی خۆی بۆ گێڕایەوە باوکی کچەکان وتی: مەترسە، تۆ ئیتر ڕزگارت بوو لە دەست قەومی ستەمکار.

(٢٦) یەکێک لە کچەکان وتی: بابە بۆ بە کرێی ناگریت، چونکە بەڕاستی چاکترین کەسێک کە تۆ بیگریت بە کرێ، ئەم پیاوە بەهێزو ئەمین و دەسپاک و دەروون پاکەیە.

(٢٧) باوکیان پێشنیارەکەی پێ باش بوو بۆیە وتی: من پێم چاکە بتکەم بە کوڕی خۆم، بە زاوای خۆم، یەکێک لەم دوو کچەت لێ مارە بکەم بەمەرجی ئەوەی هەشت ساڵ لای من کار بکەیت، خۆ ئەگەر دە ساڵیشت بردە سەر ئەوە چاکەی خۆتە، منیش نامەوێت بێزارت بکەم و زۆرت بۆ بهێنم، دەمبینیت ئەگەر خوا بیەوێت لە چاکان دەبم؟

(٢٨) موسا پێشنیارەکەی لا پەسەند بوو بۆیە وتی: ئەم پەیمانە لە نێوان من و تۆدایە، من پێی ڕازیم، بەڵام هەرکام لەو ماوانەم بۆ تەواوکرا با ستەمم لێ نەکرێت و ئازادبم، خوای گەورەش شایەت و ئاگایە بەوەی کە دەیڵێین و بڕیاری لەسەر دەدەین.



﴿فَلَمَّا قَضَىٰ مُوسَى ٱلْأَجَلَ وَسَارَ بِأَهْلِهِۦٓ ءَانَسَ مِن جَانِبِ ٱلطُّورِ نَارًا قَالَ لِأَهْلِهِ ٱمْكُثُوٓا۟ إِنِّىٓ ءَانَسْتُ نَارًا لَّعَلِّىٓ ءَاتِيكُم مِّنْهَا بِخَبَرٍ أَوْ جَذْوَةٍ مِّنَ ٱلنَّارِ لَعَلَّكُمْ تَصْطَلُونَ ﴿٢٩﴾ فَلَمَّآ أَتَىٰهَا نُودِىَ مِن شَـٰطِئِ ٱلْوَادِ ٱلْأَيْمَنِ فِى ٱلْبُقْعَةِ ٱلْمُبَـٰرَكَةِ مِنَ ٱلشَّجَرَةِ أَن يَـٰمُوسَىٰٓ إِنِّىٓ أَنَا ٱللَّهُ رَبُّ ٱلْعَـٰلَمِينَ ﴿٣٠﴾ وَأَنْ أَلْقِ عَصَاكَ ۖ فَلَمَّا رَءَاهَا تَهْتَزُّ كَأَنَّهَا جَآنٌّ وَلَّىٰ مُدْبِرًا وَلَمْ يُعَقِّبْ ۚ يَـٰمُوسَىٰٓ أَقْبِلْ وَلَا تَخَفْ ۖ إِنَّكَ مِنَ ٱلْـَٔامِنِينَ ﴿٣١﴾ ٱسْلُكْ يَدَكَ فِى جَيْبِكَ تَخْرُجْ بَيْضَآءَ مِنْ غَيْرِ سُوٓءٍ وَٱضْمُمْ إِلَيْكَ جَنَاحَكَ مِنَ ٱلرَّهْبِ ۖ فَذَٰنِكَ بُرْهَـٰنَانِ مِن رَّبِّكَ إِلَىٰ فِرْعَوْنَ وَمَلَإِي۟هِۦٓ ۚ إِنَّهُمْ كَانُوا۟ قَوْمًا فَـٰسِقِينَ ﴿٣٢﴾ قَالَ رَبِّ إِنِّى قَتَلْتُ مِنْهُمْ نَفْسًا فَأَخَافُ أَن يَقْتُلُونِ ﴿٣٣﴾ وَأَخِى هَـٰرُونُ هُوَ أَفْصَحُ مِنِّى لِسَانًا فَأَرْسِلْهُ مَعِىَ رِدْءًا يُصَدِّقُنِىٓ ۖ إِنِّىٓ أَخَافُ أَن يُكَذِّبُونِ ﴿٣٤﴾ قَالَ سَنَشُدُّ عَضُدَكَ بِأَخِيكَ وَنَجْعَلُ لَكُمَا سُلْطَـٰنًا فَلَا يَصِلُونَ إِلَيْكُمَا ۚ بِـَٔايَـٰتِنَآ أَنتُمَا وَمَنِ ٱتَّبَعَكُمَا ٱلْغَـٰلِبُونَ ﴿٣٥﴾

(٢٩) جا کاتێک موسا ماوەی دیاریکراوی بەسەر برد و (بڕیاری گەڕانەوەیدا، لە شەوێکی ساردا) لەلایەکی کێوی طوردا ئاگرێکی بەدی کرد، بەخێزانەکەی وت: ئێوە لێرە بن، من بەڕاستی تروسکایی ئاگرێک دەبینم بەڵکو بچم هەواڵێکتان بۆ بهێنمەوە، یان چڵوسکێک ئاگرتان بۆ بهێنم تا خۆتانی پێ گەرم بکەنەوە.

(٣٠) کاتێک کە موسا لە ئاگرەکە نزیک بۆوە، لە کەناری لای ڕاستی دۆڵەکەوە لە شوێنێکی پیرۆزەوە لە پاڵ درەختەکەوە بانگی لێکرا ئەی موسا: (ئەوەی گفتوگۆت لەگەڵدا دەکات) ئەوە بەڕاستی منم ( ﷲ ) کە پەروەردگاری هەموو جیهانیانم.

(٣١) ئینجا فەرمووی: عەساکەشت فڕێ بدە، (کاتێک فڕێیدا موسا) بینی زۆر بەخێرایی دەجولێتەوە وەکو تولە مار، هەڵهات و ئاوڕی نەدایەوە، خوا فەرمووی ئەی موسا وەرە و مەترسە بەڕاستی تۆ لەو کەسانەیت کە ئەمین دەبیت و لە ترس بەدووریت.

(٣٢) ئینجا دەستت بخەرە بن باخەڵتەوە، بەشێوەیەکی سپی (وەکو بلوور، دەستت خۆی دەنوێنێت) بێگەرد و بێ پەڵە و بێعەیب، هەروەها بازووەکانت بهێنەرەوەیەک و لەسەر سینە و دڵتی دابنێ، ترس و بیمت نامێنێت، ئەم دوو (معجزة)یە دوو بەڵگەن لەلایەن پەروەردگارتەوە بۆ سەر فیرعەون و دارو دەستەی، بەڕاستی ئەوانە قەومێکی یاخی و نالەبارو تاوانبار بوون.

(٣٣) موسا وتی: پەروەردگارا خۆت دەزانیت کە بێگومان من کەسێکم لێ کوشتوون، دەترسم بمکوژنەوە.

(٣٤) هاروونی براشم زمان پاراوترە لە من، ئەویش لەگەڵ من ڕەوانە بکە، بۆ ئەوەی پشتیوانیم لێ بکات و پشتگیرم بێت و بەڕاستدانەرم بێت، چونکە من بەڕاستی دەترسم بڕوام پێنەکەن.

(٣٥) خوا فەرمووی: ئێمە پشت و بازووی تۆ بەهێز دەکەین بەهۆی براکەتەوە و دەسەڵاتێکتان پێ دەبەخشین کە نەتوانن بێنە سەرتان، جا بەهۆی موعجیزەکانمانەوە هەردووکتان و هەموو شوێنکەوتوانتان سەرکەوتوو و زاڵن.

فَلَمَّا جَآءَهُم مُّوسَىٰ بِـَٔايَٰتِنَا بَيِّنَٰتٍ قَالُواْ مَا هَٰذَآ إِلَّا سِحۡرٌ مُّفۡتَرًى وَمَا سَمِعۡنَا بِهَٰذَا فِيٓ ءَابَآئِنَا ٱلۡأَوَّلِينَ ﴿٣٦﴾ وَقَالَ مُوسَىٰ رَبِّيٓ أَعۡلَمُ بِمَن جَآءَ بِٱلۡهُدَىٰ مِنۡ عِندِهِۦ وَمَن تَكُونُ لَهُۥ عَٰقِبَةُ ٱلدَّارِۖ إِنَّهُۥ لَا يُفۡلِحُ ٱلظَّٰلِمُونَ ﴿٣٧﴾ وَقَالَ فِرۡعَوۡنُ يَٰٓأَيُّهَا ٱلۡمَلَأُ مَا عَلِمۡتُ لَكُم مِّنۡ إِلَٰهٍ غَيۡرِي فَأَوۡقِدۡ لِي يَٰهَٰمَٰنُ عَلَى ٱلطِّينِ فَٱجۡعَل لِّي صَرۡحٗا لَّعَلِّيٓ أَطَّلِعُ إِلَىٰٓ إِلَٰهِ مُوسَىٰ وَإِنِّي لَأَظُنُّهُۥ مِنَ ٱلۡكَٰذِبِينَ ﴿٣٨﴾ وَٱسۡتَكۡبَرَ هُوَ وَجُنُودُهُۥ فِي ٱلۡأَرۡضِ بِغَيۡرِ ٱلۡحَقِّ وَظَنُّوٓاْ أَنَّهُمۡ إِلَيۡنَا لَا يُرۡجَعُونَ ﴿٣٩﴾ فَأَخَذۡنَٰهُ وَجُنُودَهُۥ فَنَبَذۡنَٰهُمۡ فِي ٱلۡيَمِّۖ فَٱنظُرۡ كَيۡفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٤٠﴾ وَجَعَلۡنَٰهُمۡ أَئِمَّةٗ يَدۡعُونَ إِلَى ٱلنَّارِۖ وَيَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ لَا يُنصَرُونَ ﴿٤١﴾ وَأَتۡبَعۡنَٰهُمۡ فِي هَٰذِهِ ٱلدُّنۡيَا لَعۡنَةٗۖ وَيَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ هُم مِّنَ ٱلۡمَقۡبُوحِينَ ﴿٤٢﴾ وَلَقَدۡ ءَاتَيۡنَا مُوسَى ٱلۡكِتَٰبَ مِنۢ بَعۡدِ مَآ أَهۡلَكۡنَا ٱلۡقُرُونَ ٱلۡأُولَىٰ بَصَآئِرَ لِلنَّاسِ وَهُدٗى وَرَحۡمَةٗ لَّعَلَّهُمۡ يَتَذَكَّرُونَ ﴿٤٣﴾

(٣٦) کاتێک موسا بە موعجیزە ئاشکراکانمانەوە رووبەروویان بووە، وتیان: ئەمە هەر جادوویەکی دەست هەڵبەستە و شتێکی تر نییە، ئێمە لە باوو باپیرانی دێرینمانەوە هەواڵی یەکتاناسی و پێغەمبەران و قیامەت و لەو بابەتانەمان نەبیستووە.

(٣٧) موسا وتی: پەروەردگارم خۆی چاک دەزانێت کە کێ لەلایەن ئەوەوە بەرنامەی هیدایەتی هێناوە، سەرەنجامیش بەهەشت بۆ کێ دەبێت، بەراستی ستەمکاران سەرفراز نابن.

(٣٨) فیرعەون سەرکەشانە وتی: ئەی خەڵکینە من کەسی تر شک نابەن کە شایستە بێت بەوەی خواتان بێت جگە لە خۆم، ئەی هامان تۆ لە گڵ خشتی سوورەوە کراوم بۆ دروست بکە و قەلایەکی بەرزو پتەوم بۆ بینا بکە بەڵکو پیایدا سەربکەوم، تا خوای موسا ببینم، هەرچەندە من بەڕاستی بڕوام وایە لە ریزی درۆزنەکاندایە...!!

(٣٩) فیرعەون و سەربازان و دەست و پێوەندی بە ناحەق لەسەر زەوی (مصر)دا فیزیان کرد و خۆیان بە گەورە زانی و گومانیان وابوو کە بۆ لای ئێمە ناهێنرێنەوە.

(٤٠) سەرەنجام ئێمە خۆی و سەربازان و دەست و پێوەندیمان پێچایەوە و فڕێمان دانە ناو دەریاکەوە، سەرنج بدە و تەماشا بکە و بزانە: چۆن بوو سەرئەنجامی ستەمکاران.

(٤١) ئێمە ئەوانمان کرد بەچەند پێشەوایەک کە بانگی خەڵکی دەکەن بۆ ناو ئاگر، لە رۆژی قیامەتیشدا سەرکەوتوو نابن.

(٤٢) هەر لەم دنیادا نەفرینمان خستە شوێنیان، لە رۆژی قیامەتیشدا ئەوانە زۆر ئێسک تاڵ و رووخسار ناشیرینن.

(٤٣) سوێند بە خوا ئێمە تەوراتمان بەخشی بە موسا، دوای ئەوەی کە قەومە پێشووەکانمان لەناوبرد، (چونکە یاخی بوون) تا ببێتە هۆی بەرچاو ڕوونی و هیدایەت و ڕێنموویی و رەحمەت و میهرەبانی بۆ خەڵکی، بۆ ئەوەی یاداوەری وەربگرن و تێفکرن.

وَمَا كُنتَ بِجَانِبِ ٱلْغَرْبِيِّ إِذْ قَضَيْنَآ إِلَىٰ مُوسَى ٱلْأَمْرَ وَمَا كُنتَ مِنَ ٱلشَّٰهِدِينَ ﴿٤٤﴾ وَلَٰكِنَّآ أَنشَأْنَا قُرُونًا فَتَطَاوَلَ عَلَيْهِمُ ٱلْعُمُرُ ۚ وَمَا كُنتَ ثَاوِيًا فِىٓ أَهْلِ مَدْيَنَ تَتْلُوا۟ عَلَيْهِمْ ءَايَٰتِنَا وَلَٰكِنَّا كُنَّا مُرْسِلِينَ ﴿٤٥﴾ وَمَا كُنتَ بِجَانِبِ ٱلطُّورِ إِذْ نَادَيْنَا وَلَٰكِن رَّحْمَةً مِّن رَّبِّكَ لِتُنذِرَ قَوْمًا مَّآ أَتَىٰهُم مِّن نَّذِيرٍ مِّن قَبْلِكَ لَعَلَّهُمْ يَتَذَكَّرُونَ ﴿٤٦﴾ وَلَوْلَآ أَن تُصِيبَهُم مُّصِيبَةٌۢ بِمَا قَدَّمَتْ أَيْدِيهِمْ فَيَقُولُوا۟ رَبَّنَا لَوْلَآ أَرْسَلْتَ إِلَيْنَا رَسُولًا فَنَتَّبِعَ ءَايَٰتِكَ وَنَكُونَ مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴿٤٧﴾ فَلَمَّا جَآءَهُمُ ٱلْحَقُّ مِنْ عِندِنَا قَالُوا۟ لَوْلَآ أُوتِىَ مِثْلَ مَآ أُوتِىَ مُوسَىٰٓ ۚ أَوَلَمْ يَكْفُرُوا۟ بِمَآ أُوتِىَ مُوسَىٰ مِن قَبْلُ ۖ قَالُوا۟ سِحْرَانِ تَظَٰهَرَا وَقَالُوٓا۟ إِنَّا بِكُلٍّ كَٰفِرُونَ ﴿٤٨﴾ قُلْ فَأْتُوا۟ بِكِتَٰبٍ مِّنْ عِندِ ٱللَّهِ هُوَ أَهْدَىٰ مِنْهُمَآ أَتَّبِعْهُ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ ﴿٤٩﴾ فَإِن لَّمْ يَسْتَجِيبُوا۟ لَكَ فَٱعْلَمْ أَنَّمَا يَتَّبِعُونَ أَهْوَآءَهُمْ ۚ وَمَنْ أَضَلُّ مِمَّنِ ٱتَّبَعَ هَوَىٰهُ بِغَيْرِ هُدًى مِّنَ ٱللَّهِ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَهْدِى ٱلْقَوْمَ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٥٠﴾

(٤٤) ئەی پێغەمبەرﷺ تۆ لە بەشی رۆژئـاوای کێوی طوردا نـەبوویت کـاتێک پـەیامی خۆمـان راگەیاند بە موساو فەرمانمان پێـدا، یـەکێکیش نەبوویت لە ئامادەبووانی ئەو رووداوە.

(٤٥) بـەڵام ئێمە چەندەها نـەوەمان هێنایـە کایـەوە و تەمـەنێکی زۆر تێپـەڕی بەسـەریاندا، هەروەها وەنەبێت تۆ لـەناو دانیشتووانی شاری مەدیەندا نیشتەجێ بوو بیت و ئایەتەکانی ئێمـە بەسەریاندا بخوێنیتەوە، بەڵکو هەر ئێمەین کـە پێغەمبـەران رەوانـە دەکـەین، (بـۆ پـەندو ئامۆژگاری بۆ تۆی باس دەکەین).

(٤٦) هـەروەها لـە لای کێـوی طوریشـەوە نەبوویت کاتێک بانگمان لە موسا کرد، بـەڵکو ئـەوە رەحمـەتی تایبـەتی بـوو لەلایـەن پەروەردگارتەوە کە تۆمان کرد بە پێغەمبەر، تـا قـەومێک بێـدار بکەیتـەوە کـە پێـش تـۆ بێدارکەرەوەیەکیان بۆ رەوانە نەکراوە، بۆ ئـەوەی یـاداوەری وەربگـرن و تـێ بفکـرن و لـەو بەسەرهاتانە سوود وەربگرن.

(٤٧) خۆ ئەگەر ئـەو خەڵکـە تووشی بەڵایـەک ببونایە (پێش رەوانەکردنی تۆ ئەی محمدﷺ) بەهۆی گوناهو تاوان و دەست پێشخەری خراپیانـەوە، ئـەوە دەیـانوت: پەروەردگارا! نەدەبوو پێغەمبەرێکمان بۆ رەوانە بکەیت تا شوێنی بەرنامـە و ئایەتـەکانی تـۆ بکەوتینایـەو لـە ریزی ئیمانداراندا بووینایە؟!

(٤٨) کەچی کاتێک حەق و راستیان بۆ هات لەلایەن ئێمەوە، وتیان: نـەدە بـا موعجیزەیـەکی پـێ بدرایـە هـەروەکو ئەوەی کە درابوو بە موسا، مـەگەر ئەو جوولەکانە کاتی خۆی بێ باوەڕ نەبوون بـەوەی بـە موسـا بەخشـرابوو؟ وتیـان: ئەمانە دوو جادوون پەیدا بوون کە پشتگیریی یەکتر دەکەن و دەیانوت: بەڕاستی ئێمە باوەڕمان بەهیچ کامیان نیە.

(٤٩) (ئەی پێغەمبەرﷺ) پێیان بڵێ: دەباشە ئێوە کتێبێکی تر بهێنن لەلایەن خـواوە کـە باشترو چاکتر بێـت لـەو دووانە(واتە قورئان و تەورات)، ئەوە منیش شوێنی دەکەوم، ئەگەر ئێوە راستگۆن.

(٥٠) خۆ ئەگەر بەدەم بانگەوازی تۆوە نەهاتن (واتە نەیانتوانی کتێبی تر بهێنن)، ئەوە چاک بزانـە کـە ئەوانـە هـەر شوێنی ئارەزووی خۆیان دەکـەون، کێیش هەیـە لـەوە گومڕاتـرە کـە شـوێن ئارەزووەکـانی خـۆی کـەوتبێت، دوور لـە هیدایەت و رێنمویی خوا، بێگومان خوا هیدایەتی قەومی ستەمکار نادات.



۞ وَلَقَدْ وَصَّلْنَا لَهُمُ ٱلْقَوْلَ لَعَلَّهُمْ يَتَذَكَّرُونَ ﴿٥١﴾ ٱلَّذِينَ
ءَاتَيْنَٰهُمُ ٱلْكِتَٰبَ مِن قَبْلِهِۦ هُم بِهِۦ يُؤْمِنُونَ ﴿٥٢﴾ وَإِذَا يُتْلَىٰ عَلَيْهِمْ
قَالُوٓا۟ ءَامَنَّا بِهِۦٓ إِنَّهُ ٱلْحَقُّ مِن رَّبِّنَآ إِنَّا كُنَّا مِن قَبْلِهِۦ مُسْلِمِينَ ﴿٥٣﴾
أُو۟لَٰٓئِكَ يُؤْتَوْنَ أَجْرَهُم مَّرَّتَيْنِ بِمَا صَبَرُوا۟ وَيَدْرَءُونَ بِٱلْحَسَنَةِ
ٱلسَّيِّئَةَ وَمِمَّا رَزَقْنَٰهُمْ يُنفِقُونَ ﴿٥٤﴾ وَإِذَا سَمِعُوا۟ ٱللَّغْوَ
أَعْرَضُوا۟ عَنْهُ وَقَالُوا۟ لَنَآ أَعْمَٰلُنَا وَلَكُمْ أَعْمَٰلُكُمْ سَلَٰمٌ عَلَيْكُمْ
لَا نَبْتَغِى ٱلْجَٰهِلِينَ ﴿٥٥﴾ إِنَّكَ لَا تَهْدِى مَنْ أَحْبَبْتَ وَلَٰكِنَّ
ٱللَّهَ يَهْدِى مَن يَشَآءُ وَهُوَ أَعْلَمُ بِٱلْمُهْتَدِينَ ﴿٥٦﴾ وَقَالُوٓا۟ إِن
نَّتَّبِعِ ٱلْهُدَىٰ مَعَكَ نُتَخَطَّفْ مِنْ أَرْضِنَآ أَوَلَمْ نُمَكِّن لَّهُمْ
حَرَمًا ءَامِنًا يُجْبَىٰٓ إِلَيْهِ ثَمَرَٰتُ كُلِّ شَىْءٍ رِّزْقًا مِّن لَّدُنَّا وَلَٰكِنَّ
أَكْثَرَهُمْ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٥٧﴾ وَكَمْ أَهْلَكْنَا مِن قَرْيَةٍۭ
بَطِرَتْ مَعِيشَتَهَا فَتِلْكَ مَسَٰكِنُهُمْ لَمْ تُسْكَن مِّنۢ بَعْدِهِمْ
إِلَّا قَلِيلًا وَكُنَّا نَحْنُ ٱلْوَٰرِثِينَ ﴿٥٨﴾ وَمَا كَانَ رَبُّكَ مُهْلِكَ
ٱلْقُرَىٰ حَتَّىٰ يَبْعَثَ فِىٓ أُمِّهَا رَسُولًا يَتْلُوا۟ عَلَيْهِمْ ءَايَٰتِنَا وَمَا
كُنَّا مُهْلِكِى ٱلْقُرَىٰٓ إِلَّا وَأَهْلُهَا ظَٰلِمُونَ ﴿٥٩﴾

(٥١) سوێند بە خوا بەراستی ئێمە پەیامی خۆمانمان بەش بەش پێگەیاندوون بۆ ئەوەی پەند و یاداوەری وەربگرن.

(٥٢) ئەوانەی پێشتر کتێبی ئاسمانیمان پێ بەخشیوون، ئەوان بەو قورئانە باوەڕ دەهێنن.

(٥٣) کاتێکیش قورئان دەخوێنرێتەوە بەسەریاندا دەڵێن: ئێمە باوەڕمان پێ هێناوە چونکە بەراستی ئەمە حەقیقەت و راستەقینەیە لەلایەن پەروەردگارمانەوە پێمان راگەیەنراوە بێگومان ئێمە پێشتر هەرموسڵمان و فەرمانبەردار بووین.

(٥٤) ئەوانە دووجار پاداشتیان پێدەدرێت بە هۆی خۆگری و ئارام گریانەوە، بە چاکەش بەرهەڵستی خراپە دەکەن، ئەوانە هەروەها لەو رزق و رۆزییەی کە پێمانداون دەبەخشن.

(٥٥) ئەوانە کاتێک قسە و گوفتاری ناپەسەند و نابەجێ دەبیستن پشتی تێ دەکەن و دەڵێن بە نەفامان: کاروکردەوەی خۆمان بۆ خۆمان، کارو کردەوەی ئێوەش بۆ خۆتان، سڵاوتان لێ بێت، ئێمە شەڕخواز نین و نامانەوێت هاوڕێیەتی نەفامان بکەین.

(٥٦) بەراستی ئەی پێغەمبەرﷺ تۆ ناتوانیت ئیمان و باوەڕ ببەخشیت بەو کەسەی خۆشت دەوێت، بەڵکو خوا هەر کەسێکی بوێت دەیخاتە سەر رێگەی راست و ئیمانی پێدەبەخشێت، خوایش ئاگادارە بەوانەی کە رێبازی هیدایەتیان گرتۆتە بەر.

(٥٧) (قورەیش و باوەڕلاوازان لە هەموو سەردەمێکدا) دەیانوت: ئەگەر ئێمە شوێنی هیدایەت وبەرنامەی ئیسلام بکەوین لەگەڵ تۆدا لە ولاتی خۆماندا دەفڕێنرێین و تووشی نەهامەتی دەبین، مەگەر ئێمە شوێنێکی دوور لەستەم و پڕ لە ئاسایشمان بۆ فەراهەم نەهێناون کە جۆرەها بەروبوومی بۆدێت و لە هەموو نازو نیعمەتێک بەهرەوەرە؟ هەموویشی رزق و بەخششن لەلایەن ئێمەوە، بەڵام زۆربەیان نازانن و هەست بەدەسەڵاتی ئێمە ناکەن.

(٥٨) زۆر شارو شارۆچکەمان لەناوبرد کە دانیشتوانی یاخی و لە سنوور دەرچوو بوون لە ژیانی دنیایاندا، جا ئەوەتە خانووبەرە و شوێنەکانیان چۆڵە، مەگەر کەمێک نەبێت، هەر ئێمەش خاوەنی موڵک و خانووبەرە و سامانیان بووین.

(٥٩) پەروەردگاری تۆ هیچ ولات و شارێکی کاول نەکردووە، تا لە پایتەختەکەیدا پێغەمبەرێکی نەناردبێت کە ئایەتەکانی ئێمەیان بەسەردا بخوێنێتەوە، وەنەبێت ئێمە شار و ولاتانمان کاول کردبێت بەبێ هۆ، مەگەر کاتێک نەبێت کە دانیشتووانی ستەمکار بوون.

وَمَآ أُوتِيتُم مِّن شَيْءٍ فَمَتَٰعُ ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا وَزِينَتُهَا ۚ وَمَا عِندَ
ٱللَّهِ خَيْرٌ وَأَبْقَىٰٓ ۚ أَفَلَا تَعْقِلُونَ ﴿٦٠﴾ أَفَمَن وَعَدْنَٰهُ وَعْدًا حَسَنًا
فَهُوَ لَٰقِيهِ كَمَن مَّتَّعْنَٰهُ مَتَٰعَ ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا ثُمَّ هُوَ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ
مِنَ ٱلْمُحْضَرِينَ ﴿٦١﴾ وَيَوْمَ يُنَادِيهِمْ فَيَقُولُ أَيْنَ شُرَكَآءِيَ ٱلَّذِينَ
كُنتُمْ تَزْعُمُونَ ﴿٦٢﴾ قَالَ ٱلَّذِينَ حَقَّ عَلَيْهِمُ ٱلْقَوْلُ رَبَّنَا هَٰٓؤُلَآءِ
ٱلَّذِينَ أَغْوَيْنَآ أَغْوَيْنَٰهُمْ كَمَا غَوَيْنَا ۖ تَبَرَّأْنَآ إِلَيْكَ ۖ مَا كَانُوٓا۟ إِيَّانَا
يَعْبُدُونَ ﴿٦٣﴾ وَقِيلَ ٱدْعُوا۟ شُرَكَآءَكُمْ فَدَعَوْهُمْ فَلَمْ يَسْتَجِيبُوا۟
لَهُمْ وَرَأَوُا۟ ٱلْعَذَابَ ۚ لَوْ أَنَّهُمْ كَانُوا۟ يَهْتَدُونَ ﴿٦٤﴾ وَيَوْمَ يُنَادِيهِمْ
فَيَقُولُ مَاذَآ أَجَبْتُمُ ٱلْمُرْسَلِينَ ﴿٦٥﴾ فَعَمِيَتْ عَلَيْهِمُ ٱلْأَنۢبَآءُ
يَوْمَئِذٍ فَهُمْ لَا يَتَسَآءَلُونَ ﴿٦٦﴾ فَأَمَّا مَن تَابَ وَءَامَنَ وَعَمِلَ
صَٰلِحًا فَعَسَىٰٓ أَن يَكُونَ مِنَ ٱلْمُفْلِحِينَ ﴿٦٧﴾ وَرَبُّكَ
يَخْلُقُ مَا يَشَآءُ وَيَخْتَارُ ۗ مَا كَانَ لَهُمُ ٱلْخِيَرَةُ ۚ سُبْحَٰنَ
ٱللَّهِ وَتَعَٰلَىٰ عَمَّا يُشْرِكُونَ ﴿٦٨﴾ وَرَبُّكَ يَعْلَمُ مَا تُكِنُّ
صُدُورُهُمْ وَمَا يُعْلِنُونَ ﴿٦٩﴾ وَهُوَ ٱللَّهُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ۖ لَهُ
ٱلْحَمْدُ فِي ٱلْأُولَىٰ وَٱلْءَاخِرَةِ ۖ وَلَهُ ٱلْحُكْمُ وَإِلَيْهِ تُرْجَعُونَ ﴿٧٠﴾

(٦٠) هەرچیتان پێبەخشراوە ئەوە نازونیعمەت و زینەت و جوانی ژیانی دنیایە، بەڵام دڵنیابن کە ئەو بەشەی لای خوایە چاکترو دەوامدارترە، ئایا ئەوە عەقڵ و ژیریتان ناخەنە کار؟!

(٦١) ئایا ئەو کەسەی بەڵێنێکی چاکمان داوەتێ و پێی دەگات، وەکو ئەو کەسە وایە هەر لە ژیانی دنیادا کەمێک رابواردنی پێببەخشین، پاشان لە دەرئەنجامی کارو کردەوەی ناپوختیدا لە ئامادە کراوان بێت بۆ لێپرسینەوەو ئاگری دۆزەخ؟

(٦٢) لە رۆژێکدا بانگیان لێدەکرێت (بۆ لێپرسینەوە)، خوا، روو بەوان دەفەرموێت: ئایا لە کوێن ئەو شەریک و بتانەی کە ئێوە بە هاوەڵی منتان دادەنا بەحسابی خۆتان.

(٦٣) ئەوانەی بریاردادەی خوا دژیان دەرچوو (بەخەجاڵەتیەوە باسی ئەو کەسانە دەکەن کە گومرایان کردوون) دەڵێن: پەروەردگارا، ئا ئەوانەی گومراامان کردن، گومرامان کردن وەک خۆمان گومرا بووین، ئێمە بەرین لەوانەو لە هەڵەیان لەبەردەم دادگای تۆدا، (چونکە دەسەلاتمان بەسەر دڵیاندا نەبوو) ئەوانە (درۆ دەکەن) ئێمەیان هەر نەدەپەرست.

(٦٤) ئەوسا پێیان دەوترێت: ئادەی هاوەڵانتان و خواکانتان بانگ بکەن، جا ئەوانیش بانگیان دەکەن، بەڵام وەڵام و بەدەمەوە چوون نەبوو بۆیان، ئەو کاتە سزای سەختی دۆزەخ دەبینن، ئاوات دەخوازن کە خۆزگە بەراستی ئەوان رێبازی هیدایەتیان بگرتایەتە بەر.

(٦٥) رۆژێک دێت خوا بانگیان دەکات و پێیان دەفەرموێت: ئەوە وەڵامی پێغەمبەرانتان چۆن دایەوە؟

(٦٦) لە سەختیی ئەو رۆژە هەموو هەواڵێک فەرامۆش دەکەن (هەموو شتێکیان لەبیر دەچێت) پرسیار لە یەکتریش ناکەن.

(٦٧) جا ئەوەی تەوبەی کردووە و باوەڕی دامەزراوی هێناوە و کاروکردەوەی چاکی ئەنجام داوە، ئەوە بێگومان ئەو جۆرە کەسانە لە سەرفرازو بەختەوەران دەبن.

(٦٨) هەر پەروەردگاری تۆیە هەر چیەکی بوێت دروستی دەکات و هەڵی دەبژێرێت، خەڵکی ئەو دەسەڵاتەیان نیەو سەرپشک نەکراون، پاکی و بێگەردی و بڵندی بۆ خوایە لە بەرامبەر ئەو شتانەوە نەفامان دەیکەنە شەریک و هاوەڵ.

(٦٩) هەروەها پەروەردگاری تۆ دەزانێت ئەو خەڵکە چیان لە سینە و دەروونیاندا شاردۆتەوە وە چی دەردەخەن و ئاشکرای دەکەن.

(٧٠) خوا زاتێکە کە جگە لەو خوایەکی تر نیە، سوپاس و ستایش لە سەرەتا و کۆتاییدا، لە دونیا و قیامەتدا، هەر شایستەی ئەوە، حوکم و فەرمانڕەواییش هەر بەدەست ئەوە، هەر بۆ لای ئەویش دەبرێنەوە.

قُلْ أَرَءَيْتُمْ إِن جَعَلَ ٱللَّهُ عَلَيْكُمُ ٱلَّيْلَ سَرْمَدًا إِلَىٰ يَوْمِ ٱلْقِيَٰمَةِ مَنْ إِلَٰهٌ غَيْرُ ٱللَّهِ يَأْتِيكُم بِضِيَآءٍ أَفَلَا تَسْمَعُونَ ﴿٧١﴾ قُلْ أَرَءَيْتُمْ إِن جَعَلَ ٱللَّهُ عَلَيْكُمُ ٱلنَّهَارَ سَرْمَدًا إِلَىٰ يَوْمِ ٱلْقِيَٰمَةِ مَنْ إِلَٰهٌ غَيْرُ ٱللَّهِ يَأْتِيكُم بِلَيْلٍ تَسْكُنُونَ فِيهِ أَفَلَا تُبْصِرُونَ ﴿٧٢﴾ وَمِن رَّحْمَتِهِۦ جَعَلَ لَكُمُ ٱلَّيْلَ وَٱلنَّهَارَ لِتَسْكُنُوا۟ فِيهِ وَلِتَبْتَغُوا۟ مِن فَضْلِهِۦ وَلَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ ﴿٧٣﴾ وَيَوْمَ يُنَادِيهِمْ فَيَقُولُ أَيْنَ شُرَكَآءِىَ ٱلَّذِينَ كُنتُمْ تَزْعُمُونَ ﴿٧٤﴾ وَنَزَعْنَا مِن كُلِّ أُمَّةٍ شَهِيدًا فَقُلْنَا هَاتُوا۟ بُرْهَٰنَكُمْ فَعَلِمُوٓا۟ أَنَّ ٱلْحَقَّ لِلَّهِ وَضَلَّ عَنْهُم مَّا كَانُوا۟ يَفْتَرُونَ ﴿٧٥﴾ ۞ إِنَّ قَٰرُونَ كَانَ مِن قَوْمِ مُوسَىٰ فَبَغَىٰ عَلَيْهِمْ وَءَاتَيْنَٰهُ مِنَ ٱلْكُنُوزِ مَآ إِنَّ مَفَاتِحَهُۥ لَتَنُوٓأُ بِٱلْعُصْبَةِ أُو۟لِى ٱلْقُوَّةِ إِذْ قَالَ لَهُۥ قَوْمُهُۥ لَا تَفْرَحْ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ ٱلْفَرِحِينَ ﴿٧٦﴾ وَٱبْتَغِ فِيمَآ ءَاتَىٰكَ ٱللَّهُ ٱلدَّارَ ٱلْءَاخِرَةَ وَلَا تَنسَ نَصِيبَكَ مِنَ ٱلدُّنْيَا وَأَحْسِن كَمَآ أَحْسَنَ ٱللَّهُ إِلَيْكَ وَلَا تَبْغِ ٱلْفَسَادَ فِى ٱلْأَرْضِ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ ٱلْمُفْسِدِينَ ﴿٧٧﴾



(٧١) ئەی محمد ﷺ بڵێ: خەڵکینە هەواڵم بدەنێ ئەگەر خوا شەوگار بکات بەهەمیشەیی تا ڕۆژی قیامەت(هەر ڕۆژ نەبێتەوە)چ خوایەکی تر هەیە جگەلە الله بتوانێت ڕووناکیتان بۆ فەراهەم بهێنێت، ئایا ئێوە ئەم ڕاستیانە نابیسن؟

(٧٢) هەروەها پێیان بڵێ: هەواڵم بدەنێ ئەگەر خوا ڕۆژگاری کردە هەمیشەیی لە سەرتان، تا ڕۆژی قیامەت خایاندی، کام خوا هەیە جگە لە الله کە شەوگارتان بۆ پێش بهێنێت تا ئارامی تێدا بگرن، ئایا ئێوە سەرنجی ئەم دیاردانە نادەن و نایانبینن؟!

(٧٣) جا لە ڕەحمەت و میهرەبانی ئەو زاتە ئەوەیە کە: شەوو ڕۆژی کردووە بەهۆی ئارامی و حەوانەوە و کارو کاسپی کردن و بەهرە بردن لە بەخششەکانی، بۆ ئەوەی تا دەتوانن شوکرانە بژێر و سوپاسگوزاری بکەن.

(٧٤) ڕۆژێک دێت خوا بانگیان دەکات و پێیان دەفەرموێت: ئەوە کوان ئەو شتانەی بەگومانی ئێوە هاوەڵ و شەریکی من بوون؟!

(٧٥) (هەر لەو ڕۆژەدا) لە هەر ئوممەتێک شایەتێک لە خۆیان دەهێنینە مەیدان لە پێغەمبەران، ئەوسا بەخەڵکی سەرگەردان دەڵێین: ئادەی ئێوە بەڵگەتان چیە لەسەر لادان و گوناهتان بیهێنن، ئەو ڕۆژە ئیتر زۆر بەچاکی دەزانن و دڵنیا دەبن کە حەق و حەقیقەت لای خوایەو هەر ئەو شایستەی پەرستن بووە، هەرچی ئەو شتانەش کە بڕوایان پێی هەبوو، هەڵیان بەستبوو، هەمووی ون و نادیار و بێ نرخ دێتە بەرچاو.

(٧٦) بێگومان قاروون لە قەوم و خزمانی موسا بوو کەچی (بەهۆی ماڵ و سامانیەوە) خۆی گیف دەکردەوە بە سەریاندا و فیزی بەسەردا دەکردن، ئەوەندە ماڵ و سامان و دارایمان پێبەخشیبوو، کە بەڕاستی کلیلی گەنجینە و قاسەکانی بەچەند کەسێکی بەهێز بەگرانی هەڵدەگیران، (لەکاتی لووت بەرزیەکەیدا) هەندێک ئیمانداری خزمی پێیان وت: کەشخە مەکە و لە خۆت بایی مەبە بەم سامانە، چونکە بێگومان خوا ئەو کەسانەی خۆش ناوێت کە کەشخە دەکەن بەسەروەت و سامانیانەوە و لە خۆیان بایی دەبن.

(٧٧) هەوڵ بدە بەو ماڵ و سامانەی خوا پێی بەخشیووی ماڵی قیامەت و بەهەشتی بەرین بکڕەو بەشی خۆیشت لە دنیادا بەحەلاڵی فەرامۆش مەکە، چاکە لەگەڵ بەندەکانی خوادا بکە هەروەک خوا چاکەی هێناوەتە ڕێت، نەکەیت هەوڵی فەسادو گوناهو تاوان بدەی لە زەویدا، چونکە بەڕاستی خوا ئەو کەسانەی خۆش ناوێت تۆوی خراپە دەچێنن.

قَالَ إِنَّمَآ أُوتِيتُهُۥ عَلَىٰ عِلْمٍ عِندِىٓ ۚ أَوَلَمْ يَعْلَمْ أَنَّ ٱللَّهَ قَدْ أَهْلَكَ مِن قَبْلِهِۦ مِنَ ٱلْقُرُونِ مَنْ هُوَ أَشَدُّ مِنْهُ قُوَّةً وَأَكْثَرُ جَمْعًا ۚ وَلَا يُسْـَٔلُ عَن ذُنُوبِهِمُ ٱلْمُجْرِمُونَ ﴿٧٨﴾ فَخَرَجَ عَلَىٰ قَوْمِهِۦ فِى زِينَتِهِۦ ۖ قَالَ ٱلَّذِينَ يُرِيدُونَ ٱلْحَيَوٰةَ ٱلدُّنْيَا يَـٰلَيْتَ لَنَا مِثْلَ مَآ أُوتِىَ قَـٰرُونُ إِنَّهُۥ لَذُو حَظٍّ عَظِيمٍ ﴿٧٩﴾ وَقَالَ ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْعِلْمَ وَيْلَكُمْ ثَوَابُ ٱللَّهِ خَيْرٌ لِّمَنْ ءَامَنَ وَعَمِلَ صَـٰلِحًا وَلَا يُلَقَّىٰهَآ إِلَّا ٱلصَّـٰبِرُونَ ﴿٨٠﴾ فَخَسَفْنَا بِهِۦ وَبِدَارِهِ ٱلْأَرْضَ فَمَا كَانَ لَهُۥ مِن فِئَةٍ يَنصُرُونَهُۥ مِن دُونِ ٱللَّهِ وَمَا كَانَ مِنَ ٱلْمُنتَصِرِينَ ﴿٨١﴾ وَأَصْبَحَ ٱلَّذِينَ تَمَنَّوْا۟ مَكَانَهُۥ بِٱلْأَمْسِ يَقُولُونَ وَيْكَأَنَّ ٱللَّهَ يَبْسُطُ ٱلرِّزْقَ لِمَن يَشَآءُ مِنْ عِبَادِهِۦ وَيَقْدِرُ ۖ لَوْلَآ أَن مَّنَّ ٱللَّهُ عَلَيْنَا لَخَسَفَ بِنَا ۖ وَيْكَأَنَّهُۥ لَا يُفْلِحُ ٱلْكَـٰفِرُونَ ﴿٨٢﴾ تِلْكَ ٱلدَّارُ ٱلْـَٔاخِرَةُ نَجْعَلُهَا لِلَّذِينَ لَا يُرِيدُونَ عُلُوًّا فِى ٱلْأَرْضِ وَلَا فَسَادًا ۚ وَٱلْعَـٰقِبَةُ لِلْمُتَّقِينَ ﴿٨٣﴾ مَن جَآءَ بِٱلْحَسَنَةِ فَلَهُۥ خَيْرٌ مِّنْهَا ۖ وَمَن جَآءَ بِٱلسَّيِّئَةِ فَلَا يُجْزَى ٱلَّذِينَ عَمِلُوا۟ ٱلسَّيِّـَٔاتِ إِلَّا مَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴿٨٤﴾

(٧٨) قاروون وتی: بێگومان ئەم سامان و دارایيەم هەر بەهۆی زانست و زانیاری نەخشەی خۆمەوە پێم دراوە، باشە مەگەر قاروون نەیدەزانی بەڕاستی خوا پێش ئەم چەندەها قەوم و هۆزو گەلانی لەناوبردووە کە لەو زیاتر بە دەسەڵاتترو سەروەتمەندتر بوون؟ تاوانباران پرسیاریان لێناکرێت دەربارەی گوناهەکانیان (چونکە تۆمارە و لای خوا ئاشکرایە).

(٧٩) ئینجا ڕۆژێک قاروون خۆی سازداو بە ڕازاوەیی چووە دەرەوە بۆ ناو قەومەکەی بۆ کەشخە کردن و خۆنواندن، ئەوانەی کە ئاواتیان ژیانی دنیایە؛ وتیان: ئای خۆزگە ئێمەش وەکو قاروون، سامان و دەسەڵاتمان ببوایە، بەڕاستی خاوەنی بەختێکی گەورەیە!

(٨٠) (بەڵام) ئەوانەی کە زانستی و زانیاری ڕاستیان پێبەخشراوە (دەربارەی حەڵاڵ و حەرام و نرخی قیامەت دەزانن) وتیان: هاوار بۆ ئێوە، بۆ تێنافکرن پاداشتی خوایی زۆر چاکترە بۆ ئەو کەسەی باوەڕی دامەزراوی هێناوەو کارو کردەوەی چاکی ئەنجام داوە، ئەو زانست و باوەڕو کردەوەیە بە کەس نادرێت، تەنها بە خۆگرو ئارامگران نەبێت .

(٨١) ئەوسا (کە بینیمان قاروون بەتەواوی لە سنوور دەرچووە) کوتوپڕ خۆی و ماڵ و سامانیمان برد بەناخی زەویدا، هیچ دەستەو گرۆیەکی نەبوو فریای بکەوێت و لە دەست خەشم و قینی خوا دەربازی بکات، بێگومان لەو کەسانەش نەبوو کە بتوانێت خۆی ڕزگار ببێت.

(٨٢) ئینجا ئەوانەی دوێنێ ئاواتیان بە قاروون دەخواست دەیانوت: ئەی هاوار؛ بەس نەبوو وەکو ئەو تیانەچووین؛ دیارە کە خوا ڕزق و ڕۆزی زۆر دەبەخشێت بە هەر کەس بیەوێت یاخود کەمی دەکاتەوە (بێ حیکمەت نیە)، ئەگەر فەزڵ و بەهرەی خوایی نەبوایە لەسەرمان، ئێمەش بەناخی زەویدا ڕۆچوو دەبووین، ئای کە ڕوون و ئاشکرایە ، کافرو خوانەناسان سەرفراز نابن.

(٨٣) (جا با خەڵکی دڵنیابن) کە: ئەو ماڵی قیامەتە و ئەو بەهەشتی بەرینەمان ئامادەکردووە بۆ ئەو کەسانەی کە ئەلووت بەرزی و گەورەییان دەوێت لە زەویدا، نە فەسادو گوناهو خراپە، سەرەنجام و سەرفرازیش هەر بۆ پارێزکاران و خواناسەکانە.

(٨٤) ئەوەی بە کاروکردەوەی چاکەوە بێت، ئەوە چاکتر دێتەوە ڕێی، ئەوەش بەگوناهو هەڵەوە بێت، ئەوە پاداشتی ئەوانەی کە گوناهو هەڵەیان کردووە نادرێتەوە، تەنها ئەوە نەبێت کە دەیانکرد.

إِنَّ ٱلَّذِى فَرَضَ عَلَيْكَ ٱلْقُرْءَانَ لَرَآدُّكَ إِلَىٰ مَعَادٍ ۚ قُل رَّبِّىٓ أَعْلَمُ مَن جَآءَ بِٱلْهُدَىٰ وَمَنْ هُوَ فِى ضَلَـٰلٍ مُّبِينٍ ﴿٨٥﴾ وَمَا كُنتَ تَرْجُوٓا۟ أَن يُلْقَىٰٓ إِلَيْكَ ٱلْكِتَـٰبُ إِلَّا رَحْمَةً مِّن رَّبِّكَ ۖ فَلَا تَكُونَنَّ ظَهِيرًا لِّلْكَـٰفِرِينَ ﴿٨٦﴾ وَلَا يَصُدُّنَّكَ عَنْ ءَايَـٰتِ ٱللَّهِ بَعْدَ إِذْ أُنزِلَتْ إِلَيْكَ ۖ وَٱدْعُ إِلَىٰ رَبِّكَ ۖ وَلَا تَكُونَنَّ مِنَ ٱلْمُشْرِكِينَ ﴿٨٧﴾ وَلَا تَدْعُ مَعَ ٱللَّهِ إِلَـٰهًا ءَاخَرَ ۘ لَآ إِلَـٰهَ إِلَّا هُوَ ۚ كُلُّ شَىْءٍ هَالِكٌ إِلَّا وَجْهَهُۥ ۚ لَهُ ٱلْحُكْمُ وَإِلَيْهِ تُرْجَعُونَ ﴿٨٨﴾

سُورَةُ العَنكَبُوتِ

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَـٰنِ ٱلرَّحِيمِ

الٓمٓ ﴿١﴾ أَحَسِبَ ٱلنَّاسُ أَن يُتْرَكُوٓا۟ أَن يَقُولُوٓا۟ ءَامَنَّا وَهُمْ لَا يُفْتَنُونَ ﴿٢﴾ وَلَقَدْ فَتَنَّا ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ ۖ فَلَيَعْلَمَنَّ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ صَدَقُوا۟ وَلَيَعْلَمَنَّ ٱلْكَـٰذِبِينَ ﴿٣﴾ أَمْ حَسِبَ ٱلَّذِينَ يَعْمَلُونَ ٱلسَّيِّـَٔاتِ أَن يَسْبِقُونَا ۚ سَآءَ مَا يَحْكُمُونَ ﴿٤﴾ مَن كَانَ يَرْجُوا۟ لِقَآءَ ٱللَّهِ فَإِنَّ أَجَلَ ٱللَّهِ لَـَٔاتٍ ۚ وَهُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْعَلِيمُ ﴿٥﴾ وَمَن جَـٰهَدَ فَإِنَّمَا يُجَـٰهِدُ لِنَفْسِهِۦٓ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ لَغَنِىٌّ عَنِ ٱلْعَـٰلَمِينَ ﴿٦﴾

(٨٥) بەراستی ئەو زاتەی کە گەیاندنی قورئانی لەسەر تۆ پێویست کردووە، سەرەنجام دەتگێڕێتەوە بۆ مەککە، یان قیامەت و بەهەشتی بەرین، ئەی پێغەمبەر ﷺ پێیان بڵێ: پەروەردگارم خۆی چاک دەزانێت و لە هەموو کەس زاناترە بەو کەسەی کە ڕێنموویی و هیدایەتی هێناوە و بەو کەسەش کە لەناو گومڕاییەکی ئاشکرادایە.

(٨٦) تۆ ئەی محمد ﷺ بەتەما نەبوویت قورئانت بۆ ڕەوانە بکرێت، جگەلە میهرەبانیەک نەبێت لە لایەن پەروەردگارتەوە؛ کەوابوو خۆت مەکە بە پشتیوان و هاوکاری بێ باوەڕ و خوانەناسان.

(٨٧) با بێ باوەڕان بەرگریت نەکەن لەگەیاندنی ئایەتەکانی خوا، دوای ئەو کاتەی بۆ تۆ دابەزێنراوە، هەمیشە بانگەشە بکە بۆ لای پەروەردگارت، هەرگیز نەکەیت خۆت بخەیتە ڕیزی هاوەڵگەرانەوە.

(٨٨) لەگەڵ خوادا هانا و هاوار لە خوایەکی تر مەکە، چونکە جگە لەو زاتە خوایەکی تر نیە، هەرچی شت هەیە تیاچووە و لەناوچووە جگە لەو زاتە، فەرمانڕەوایی هەر شایستەی ئەوە، هەموانیش هەر بۆ لای ئەو دەبرێنەوە.

سوورەتی (العنکبوت)

بەناوی خوای بەخشندە و میهرەبان

(١) سەرنجی سەرەتای سوورەتی (البقرة) بدە.

(٢) ئایا خەڵکی وایانزانیووە؛ وازیان لێدەهێنرێت و پشتگوێ دەخرێن کە بڵێن ئیمان و باوەڕمان هێناوە، لەکاتێکدا ئەوان تاقی نەکرێنەوە و تووشی سزا و ئازار نەکرێن؟

(٣) سوێند بەخوا بێگومان ئێمە ئەوانەی پێش ئەمانمان تاقیکردۆتەوە بە جۆرەها شێوە، تا خوای گەورە (لە جیهانی واقیعدا) ئەوانەی ڕاستیان کردووە بیانناسێت و دەرکەون، هەروەها درۆزنەکانیش دەبێت بناسێت و دەرکەون.

(٤) ئایا ئەوانەی خراپە و نادروستی دەکەن وادەزانن کە لە دەستمان دەردەچن و دەرباز دەبن؟! ئای چەندە خراپە ئەو بڕیارەی کە دەیدەن.

(٥) ئەوەی کە ئاواتەخوازە بەدیداری خوا شاد ببێت، با دڵنیابێت کەکاتی دیاریکراوی خوا، ساتی سەرەمەرگ هەر دێت (تا بەدیداری شاد ببێت)، ئەو خوایە زۆر بیسەرە (بەگوفتاری بەندەکانی) و زانایە بەحاڵیان.

(٦) ئەوەش کە هەوڵ دەدات و کۆشش دەکات لەپێناوی گەیاندنی ئاینی خوادا؛ بێگومان قازانج و سوودی هەوڵ و کۆششەکەی هەر بۆ خۆیەتی، چونکە بەراستی خوا بێ نیازە لە هەموو خەڵکی.

(بەڵام لە قیامەتدا ئەو زاتە زۆر سوپاسگوزاری ئەو کەسانەیە کە هەوڵ و کۆششیان داوە لە پێناوی ئاینەکەیدا).

وَالَّذِينَ ءَامَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ لَنُكَفِّرَنَّ عَنْهُمْ سَيِّئَاتِهِمْ وَلَنَجْزِيَنَّهُمْ أَحْسَنَ الَّذِي كَانُوا يَعْمَلُونَ ﴿٧﴾ وَوَصَّيْنَا الْإِنسَانَ بِوَالِدَيْهِ حُسْنًا وَإِن جَاهَدَاكَ لِتُشْرِكَ بِي مَا لَيْسَ لَكَ بِهِ عِلْمٌ فَلَا تُطِعْهُمَا إِلَيَّ مَرْجِعُكُمْ فَأُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴿٨﴾ وَالَّذِينَ ءَامَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ لَنُدْخِلَنَّهُمْ فِي الصَّالِحِينَ ﴿٩﴾ وَمِنَ النَّاسِ مَن يَقُولُ ءَامَنَّا بِاللَّهِ فَإِذَا أُوذِيَ فِي اللَّهِ جَعَلَ فِتْنَةَ النَّاسِ كَعَذَابِ اللَّهِ وَلَئِن جَاءَ نَصْرٌ مِّن رَّبِّكَ لَيَقُولُنَّ إِنَّا كُنَّا مَعَكُمْ أَوَلَيْسَ اللَّهُ بِأَعْلَمَ بِمَا فِي صُدُورِ الْعَالَمِينَ ﴿١٠﴾ وَلَيَعْلَمَنَّ اللَّهُ الَّذِينَ ءَامَنُوا وَلَيَعْلَمَنَّ الْمُنَافِقِينَ ﴿١١﴾ وَقَالَ الَّذِينَ كَفَرُوا لِلَّذِينَ ءَامَنُوا اتَّبِعُوا سَبِيلَنَا وَلْنَحْمِلْ خَطَايَاكُمْ وَمَا هُم بِحَامِلِينَ مِنْ خَطَايَاهُم مِّن شَيْءٍ إِنَّهُمْ لَكَاذِبُونَ ﴿١٢﴾ وَلَيَحْمِلُنَّ أَثْقَالَهُمْ وَأَثْقَالًا مَّعَ أَثْقَالِهِمْ وَلَيُسْأَلُنَّ يَوْمَ الْقِيَامَةِ عَمَّا كَانُوا يَفْتَرُونَ ﴿١٣﴾ وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا نُوحًا إِلَىٰ قَوْمِهِ فَلَبِثَ فِيهِمْ أَلْفَ سَنَةٍ إِلَّا خَمْسِينَ عَامًا فَأَخَذَهُمُ الطُّوفَانُ وَهُمْ ظَالِمُونَ ﴿١٤﴾

(٧) ئەوانەی کە ئیمان و باوەڕیان هێناوەو کارو کردەوە چاکەکانیان ئەنجام داوە، بەڕاستی هەڵە و گوناهەکانیان دەسڕینەوە و بەچاکتر لەوەی کە دەیانکرد پاداشتیان دەدەینەوە.

(٨) ئێمە فەرمانمانداوە بە ئادەمیزاد کە چاك ڕەفتار بێت لەگەڵ دایك و باوكیدا، خۆ ئەگەر زۆریان لێکردیت تا هاوەڵ و هاوبەشم بۆ بڕیار بدەیت، بێ ئەوەی زانست و زانیاریت هەبێت دەربارەی، ئەوە ملکەچیان مەبەو بەگوێیان مەکە، دڵنیاش بن کە گەڕانەوەتان بۆ لای منە، ئەو کاتە ئاگادارتان دەکەمەوە لەو کردەوانەی کە ئەنجامتان دەدا.

(٩) جا ئەوانەی کە ئیمان و باوەڕیان هێناوە و کارو کردەوە چاکەکانیان ئەنجام داوە، ئەوە بێگومان دەیانخەینە ریزی چاکەکارانەوە.

(١٠) هەندێك لەخەڵکی هەن کە دەڵێن: باوەڕمان بەخوا هێناوە، جا کاتێك یەکێك لەوانە لەبەر خواو لەپێناوی خوادا تووشی ئازارو ناخۆشی کرا، وادەزانێت سزاو ئەشکەنجەی خەڵکی وەك سزای خوا وایە (وەك چۆن لە دۆزەخدا پەشیمانە لێرەش بەهۆی ئەشکەنجەی خەڵکیەوە لە دین پەشیمان دەبێتەوە)، بەڕاستی ئەگەر پەروەردگارت سەرکەوتنێکی بەخشی، دووڕووەکان بەگەرمی دەڵێن: خۆ ئێمەش بێگومان هاوکارتان بووین، مەگەر خوا خۆی نازانێت چی حەشاردراوە لە دەروونی هەموو خەڵکیدا (بەتایبەت لە دڵی ئەو جۆرە کەسانەدا)؟

(١١) سوێند بێت، خوا ئاگادارە بەوانەی باوەڕیان هێناوە، هەروەها بەوانەش کە دووڕوون (جیایان دەکاتەوە).

(١٢) ئەوانەی کە بێ باوەڕ بوون وتیان بەوانەی کە باوەڕیان هێناوە: وەرن شوێنی ڕێبازی ئێمە بکەون (ئەگەر شوێنکەوتنی ڕێبازی ئێمە هەڵە بێت) ئەوە گوناهتان بە ئەستۆی ئێمە، ئەڵبەتە ئەوانە لە قیامەتدا ناتوانن هیچ گوناهو تاوانێکی ئەوان بگرنە ئەستۆ، بەڕاستی ئەوانە هەر درۆدەکەن و درۆزنن.

(١٣) سوێند بە خوا سەرئەنجام گوناهی سەنگینی خۆیان و ئەو کەسانەش کە گومڕایان کردوون دەبێتە سەرباریان، لە ڕۆژی قیامەتیشدا پرسیاریان لێدەکرێت لەو درۆو دەلەسە و تەڵەکەبازییەی کە هەڵیاندەبەست.

(١٤) سوێند بەخوا ئێمە ـ نوح ـ مان ڕەوانە کرد بۆسەر قەوم و هۆزەکەی، هەزار ساڵ پەنجا کەم لەناویاندا مایەوە، سەرئەنجام لافاو و زریان هەموویانی پێچایەوە لە کاتێکدا ئەوان ستەمکار بوون.

فَأَنجَيْنَٰهُ وَأَصْحَٰبَ ٱلسَّفِينَةِ وَجَعَلْنَٰهَآ ءَايَةً لِّلْعَٰلَمِينَ ﴿١٥﴾ وَإِبْرَٰهِيمَ إِذْ قَالَ لِقَوْمِهِ ٱعْبُدُوا۟ ٱللَّهَ وَٱتَّقُوهُ ذَٰلِكُمْ خَيْرٌ لَّكُمْ إِن كُنتُمْ تَعْلَمُونَ ﴿١٦﴾ إِنَّمَا تَعْبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ أَوْثَٰنًا وَتَخْلُقُونَ إِفْكًا ۚ إِنَّ ٱلَّذِينَ تَعْبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ لَا يَمْلِكُونَ لَكُمْ رِزْقًا فَٱبْتَغُوا۟ عِندَ ٱللَّهِ ٱلرِّزْقَ وَٱعْبُدُوهُ وَٱشْكُرُوا۟ لَهُۥٓ ۖ إِلَيْهِ تُرْجَعُونَ ﴿١٧﴾ وَإِن تُكَذِّبُوا۟ فَقَدْ كَذَّبَ أُمَمٌ مِّن قَبْلِكُمْ ۖ وَمَا عَلَى ٱلرَّسُولِ إِلَّا ٱلْبَلَٰغُ ٱلْمُبِينُ ﴿١٨﴾ أَوَلَمْ يَرَوْا۟ كَيْفَ يُبْدِئُ ٱللَّهُ ٱلْخَلْقَ ثُمَّ يُعِيدُهُۥٓ ۚ إِنَّ ذَٰلِكَ عَلَى ٱللَّهِ يَسِيرٌ ﴿١٩﴾ قُلْ سِيرُوا۟ فِى ٱلْأَرْضِ فَٱنظُرُوا۟ كَيْفَ بَدَأَ ٱلْخَلْقَ ۚ ثُمَّ ٱللَّهُ يُنشِئُ ٱلنَّشْأَةَ ٱلْءَاخِرَةَ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ ﴿٢٠﴾ يُعَذِّبُ مَن يَشَآءُ وَيَرْحَمُ مَن يَشَآءُ ۖ وَإِلَيْهِ تُقْلَبُونَ ﴿٢١﴾ وَمَآ أَنتُم بِمُعْجِزِينَ فِى ٱلْأَرْضِ وَلَا فِى ٱلسَّمَآءِ ۖ وَمَا لَكُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ مِن وَلِىٍّ وَلَا نَصِيرٍ ﴿٢٢﴾ وَٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ وَلِقَآئِهِۦٓ أُو۟لَٰٓئِكَ يَئِسُوا۟ مِن رَّحْمَتِى وَأُو۟لَٰٓئِكَ لَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿٢٣﴾

(١٥) ئەو کاتە ئیتر ئەومان رزگارکرد هاوڕێ لەگەڵ هەموو سەرنشینەکانی کەشتیەکەدا و ئەو رووداو و کەشتیەمان کردە بەڵگە و نیشانە بۆ هەموولایەک و هەموو نەوەکان.

(١٦) باسی ئیبراهیمیش بکە کە کاتی خۆی بە قەوم و هۆزی خۆی وت: تەنها خوا بپەرستن و هەر لەو بترسن، ئەو بیروباوەڕە چاک و پەسەند و خێردارترە بۆتان، ئەگەر بزانن و تێبگەن.

(١٧) بەڕاستی ئەو شتانەی کە لەجیاتی خوا دەیانپەرستن تەنها بت و پەیکەرن، ئێوە بوختان و شتی نابەجێ دروست دەکەن، بێگومان ئەو شتانەی کە لەجیاتی خوا دەیانپەرستن خاوەنی هیچ رزق و رۆزیەک نین بۆ ئێوە، کەواتە هەر داوای رزق و رۆزی لە خوا بکەن، هەر ئەویش بپەرستن، هەر سوپاسگوزاری ئەو بن، بۆ لای ئەویش دەبرێنەوە.

(١٨) خۆ ئەگەر ئێوە ئەم پەیامە بەدرۆ دەزانن (وەنەبێت یەکەم هۆزو گەل بن کە لەبەرامبەری پەیامی خواوە هەڵوێستتان ئاوا ناڕەوا بێت) ئەوە بەڕاستی گەلانێکی پێش ئێوەش پەیامی خوایان بەدرۆ دەزانی، پێغەمبەریش تەنها گەیاندن و روونکردنەوەی ئاشکرا ئەرکی سەرشانێتی و هیچی تر.

(١٩) ئایا ئەوە سەرنجیان نەداوە چۆن خوا لە سەرەتاوە دروستکراوان بەدی دەهێنێت و پاشان دووبارەی دەکاتەوە، بێگومان ئەو شتانە بۆ خوا زۆر سادە و ئاسانە.

(٢٠) (ئەی پێغەمبەرﷺ) پێیان بڵێ: با بگەرێن بە زەویدا، تەماشا بکەن و سەرنج بدەن چۆن ئەو زاتە دروستکراوانی بەدیهێناوە، لەوەودواش هەر خوا سەرلەنوێ بەرپایان دەکاتەوە (بە شێوەو شێوازێکی تر ئاسمانەکان و زەوی و ئێمەش دەهێنێتەوە کایە) بەڕاستی خوا دەسەڵاتی بەسەر هەموو شتێکدا هەیە.

(٢١) هەندێک جار: سزای ئەو کەسانە دەدات کە خوا بیەوێت و شایستەی سزان و سۆزو میهرەبانی خۆیشی دەنوێنێت بۆ ئەوانەی کە دەیوێت و باوەڕدارن، سەرئەنجامیش هەر بۆ لای ئەو زاتە دەبرێنەوە.

(٢٢) (ئەی گرۆی نادەمیزاد) ئێوە ناتوانن خوا دەسەوسان بکەن، نە لە زەویدا نە لە ئاسماندا، کەسیش نیە جگە لە خوا پشتیوانتان بێت و فریاتان بکەوێت (ئەگەر رێگەی چەوت و نادروست بگرن).

(٢٣) ئەوانەی کە بڕوایان نیە بەئایەت و فەرمانەکانی خواو بەدیدار ئامادەبوونی بەردەم بارەگاکەی (بۆ لێپرسینەوە) ئا ئەوانە (خوا دەفەرموێت) لە میهرەبانی من نائومێدن و ئەوانە سزای زۆر بەئێش بۆیان ئامادەیە.

فَمَا كَانَ جَوَابَ قَوْمِهِۦٓ إِلَّآ أَن قَالُوا۟ ٱقْتُلُوهُ أَوْ حَرِّقُوهُ فَأَنجَىٰهُ ٱللَّهُ مِنَ ٱلنَّارِ ۚ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَـَٔايَـٰتٍ لِّقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ ﴿٢٤﴾ وَقَالَ إِنَّمَا ٱتَّخَذْتُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ أَوْثَـٰنًا مَّوَدَّةَ بَيْنِكُمْ فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا ۖ ثُمَّ يَوْمَ ٱلْقِيَـٰمَةِ يَكْفُرُ بَعْضُكُم بِبَعْضٍ وَيَلْعَنُ بَعْضُكُم بَعْضًا وَمَأْوَىٰكُمُ ٱلنَّارُ وَمَا لَكُم مِّن نَّـٰصِرِينَ ﴿٢٥﴾ ۞ فَـَٔامَنَ لَهُۥ لُوطٌ ۘ وَقَالَ إِنِّى مُهَاجِرٌ إِلَىٰ رَبِّىٓ ۖ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ ﴿٢٦﴾ وَوَهَبْنَا لَهُۥٓ إِسْحَـٰقَ وَيَعْقُوبَ وَجَعَلْنَا فِى ذُرِّيَّتِهِ ٱلنُّبُوَّةَ وَٱلْكِتَـٰبَ وَءَاتَيْنَـٰهُ أَجْرَهُۥ فِى ٱلدُّنْيَا ۖ وَإِنَّهُۥ فِى ٱلْـَٔاخِرَةِ لَمِنَ ٱلصَّـٰلِحِينَ ﴿٢٧﴾ وَلُوطًا إِذْ قَالَ لِقَوْمِهِۦٓ إِنَّكُمْ لَتَأْتُونَ ٱلْفَـٰحِشَةَ مَا سَبَقَكُم بِهَا مِنْ أَحَدٍ مِّنَ ٱلْعَـٰلَمِينَ ﴿٢٨﴾ أَئِنَّكُمْ لَتَأْتُونَ ٱلرِّجَالَ وَتَقْطَعُونَ ٱلسَّبِيلَ وَتَأْتُونَ فِى نَادِيكُمُ ٱلْمُنكَرَ ۖ فَمَا كَانَ جَوَابَ قَوْمِهِۦٓ إِلَّآ أَن قَالُوا۟ ٱئْتِنَا بِعَذَابِ ٱللَّهِ إِن كُنتَ مِنَ ٱلصَّـٰدِقِينَ ﴿٢٩﴾ قَالَ رَبِّ ٱنصُرْنِى عَلَى ٱلْقَوْمِ ٱلْمُفْسِدِينَ ﴿٣٠﴾



(٢٤) وەڵامی قەوم و هۆزەکەی ئیبراهیم تەنها ئەوەبوو وتیان: بیکوژن یان بیسوتێنن بەڵام خوا لە ئاگرەکە رزگاری کرد، بێگومان ئا لەو پێشهاتەدا نیشانە و بەڵگەی زۆر هەیە بۆ ئەو کەسانەی کە ئیمان و باوەڕ دەهێنن.

(٢٥) لەوەودوا پێی وتن: بەڕاستی ئەوەی ئێوە لەجیاتی خوا دەتانپەرست تەنها بت و پەیکەرن، لەبەرخاتری یەکترو رێزدانانتان بۆ یەکترە لە ژیانی دنیادا، دواجار لە رۆژی قیامەتدا یەکتر کافردەکەن و یەخەی یەکتر دەگرن، هەندێکیشتان نەفرین لە هەندێکی ترتان دەکەن، سەرەنجامیش شوێن و جێگەی دیاریکراوتان ناو ئاگرە، رزگارکەریشتان نییە.

(٢٦) ئینجا لوط ـ باوەڕی پێ هێنا، ئیبراهیم دوای ئەوەی کە نائومێد بوو لە قەومەکەی وتی: بەڕاستی من ئیتر کۆچ دەکەم بۆ لای پەروەردگارم (بۆ ئەو شوێنەی کە ئەو بۆم دیاری دەکات)، چونکە بەڕاستی ئەو زاتێکی زۆر بە دەسەڵات و دانایە.

(٢٧) پاشان ئیسحاقمان پێبەخشی و یەعقوبیشمان بە ئیسحاق بەخشی و پێغەمبەرایەتیمان کردە کاڵای باڵای نەوەکانی، کتێبە ئاسمانیەکانیشمان بۆ ناردن، هەر لە دنیادا پاداشتمان دایەوە، ئەو بەڕاستی لە قیامەتیشدا لە ریزی پیاوچاکاندایە.

(٢٨) یادی (لوط) یش بکە کاتێک بە قەومەکەی وت: ئێوە بەڕاستی تاوانێکی گەورە دەکەن، ئێوە گوناهێکی ناشیرین ئەنجام دەدەن، هیچ کەس بەر لە ئێوە بەکاری وا هەڵنەساوە!!!

(٢٩) ئایا ئێوە بەراستتانە نێربازیی دەکەن و رێگە بەخەڵکی دەگرن و لە یانەکەتاندا کاری نابەجێ و ناشیرین و نادروست ئەنجام دەدەن ؟! کەچی وەڵامی قەومی (بەدخوو) تەنها ئەوەبوو کە وتیان: ئادەی کوا سزاو تۆڵەی خوا، ئەگەر تۆ راست دەکەیت ؟! بۆمان بیهێنە؟

(٣٠) (لوط دوعای لێکردن) وتی: پەروەردگارا، سەرکەوتنم پێ ببەخشە بەسەر ئەم قەومەی کە تۆوی خراپە دەچێنن.

وَلَمَّا جَاءَتْ رُسُلُنَا إِبْرَٰهِيمَ بِٱلْبُشْرَىٰ قَالُوٓا۟ إِنَّا مُهْلِكُوٓا۟ أَهْلِ هَٰذِهِ ٱلْقَرْيَةِ ۖ إِنَّ أَهْلَهَا كَانُوا۟ ظَٰلِمِينَ ﴿٣١﴾ قَالَ إِنَّ فِيهَا لُوطًا ۚ قَالُوا۟ نَحْنُ أَعْلَمُ بِمَن فِيهَا ۖ لَنُنَجِّيَنَّهُۥ وَأَهْلَهُۥٓ إِلَّا ٱمْرَأَتَهُۥ كَانَتْ مِنَ ٱلْغَٰبِرِينَ ﴿٣٢﴾ وَلَمَّآ أَن جَآءَتْ رُسُلُنَا لُوطًا سِىٓءَ بِهِمْ وَضَاقَ بِهِمْ ذَرْعًا وَقَالُوا۟ لَا تَخَفْ وَلَا تَحْزَنْ ۖ إِنَّا مُنَجُّوكَ وَأَهْلَكَ إِلَّا ٱمْرَأَتَكَ كَانَتْ مِنَ ٱلْغَٰبِرِينَ ﴿٣٣﴾ إِنَّا مُنزِلُونَ عَلَىٰٓ أَهْلِ هَٰذِهِ ٱلْقَرْيَةِ رِجْزًا مِّنَ ٱلسَّمَآءِ بِمَا كَانُوا۟ يَفْسُقُونَ ﴿٣٤﴾ وَلَقَد تَّرَكْنَا مِنْهَآ ءَايَةًۢ بَيِّنَةً لِّقَوْمٍ يَعْقِلُونَ ﴿٣٥﴾ وَإِلَىٰ مَدْيَنَ أَخَاهُمْ شُعَيْبًا فَقَالَ يَٰقَوْمِ ٱعْبُدُوا۟ ٱللَّهَ وَٱرْجُوا۟ ٱلْيَوْمَ ٱلْءَاخِرَ وَلَا تَعْثَوْا۟ فِى ٱلْأَرْضِ مُفْسِدِينَ ﴿٣٦﴾ فَكَذَّبُوهُ فَأَخَذَتْهُمُ ٱلرَّجْفَةُ فَأَصْبَحُوا۟ فِى دَارِهِمْ جَٰثِمِينَ ﴿٣٧﴾ وَعَادًا وَثَمُودَا۟ وَقَد تَّبَيَّنَ لَكُم مِّن مَّسَٰكِنِهِمْ ۖ وَزَيَّنَ لَهُمُ ٱلشَّيْطَٰنُ أَعْمَٰلَهُمْ فَصَدَّهُمْ عَنِ ٱلسَّبِيلِ وَكَانُوا۟ مُسْتَبْصِرِينَ ﴿٣٨﴾

(٣١) جا کاتێک کە فریشتەکانمان گەیشتنە لای ئیبراهیم و مژدەی هاتنە دنیای ئیسحاقیان پێبەخشی، وتیان: بەڕاستی ئێمە لەناوبەری خەڵکی ئەم شارەین، چونکە بێگومان خەڵکەکەی زۆر ستەمکار بوون.

(٣٢) ئیبراهیم وتی: ئاخر (لوط) لەوێیە، فریشتەکان وتیان: ئێمە چاکتر دەزانین کێی لێیە، دڵنیابە کە ئەوو خاوخێزانی رزگاردەکەین جگە لە هاوسەرەکەی کە لە تیاچووان دەبێت.

(٣٣) جا کاتێک فریشتەکان گەیشتنە لای (لوط)، بە هاتنیان زۆر دڵتەنگ و غەمبار بوو، (نەیدەزانی کە فریشتەن) سەری دنیای لێ هاتەوە یەک، وتیان: مەترسەو غەمت نەبێت (ئەوانە ناتوانن دەستدرێژی بکەنە سەر ئێمە، ئێمە فریشتەین)، بێگومان ئێمە رزگارکەری تۆو کەس و کارەکەتین جگە لە هاوسەرەکەت، کە لە تیاچووانە.

(٣٤) بەڕاستی ئێمە دابەزێنەری سزاو بەڵای ئاسمانین بەسەر خەڵکی ئەم شارەدا بەهۆی ئەوەی کە دەردەچوون لە فەرمانی خوا.

(٣٥) سوێند بەخوا بەڕاستی سەرئەنجام ئاسەوارێکی ئاشکرامان (لە شاری کاول و وێران) بەجێ هێشت بۆ کەسانێک کە ژیر و هۆشمەندبن (کە تێ بگەن و سەرنج بدەن).

(٣٦) هەروەها شوعەیبمان رەوانە کرد بۆ ناو براکانی لە شاری مەدیەن، پێی وتن: ئەی قەوم و هۆزم تەنها خوا بپەرستن، بە هیوای قیامەت و ئایندەوە بژین و ترسی تەنگانەی ئەو رۆژەتان هەبێت، گوناهو تاوان و خراپە لەسەر زەویدا ئەنجام مەدەن و مەچێنن (چونکە زەوی بێ خاوەن نیە و ژیانتان تا سەر نیە).

(٣٧) لە ئاکامدا خەڵکەکە بڕوایان پێنەکرد، ئیتر بوومەلەرزەیەک دووچاریان بوو، هەر هەموویان لە ماڵەکانیاندا بەچۆکدا هاتن و مردن (بوون بەژێر خاک و خۆڵەوە).

(٣٨) هەروەها (عاد)ی قەومی (هود) و (ثمود)ی قەومی (صالح) یشمان لەناوبرد کە ئاشکرا بوو بۆتان تیاچوونیان لە شوێنەواری کاولیانەوە، شەیتانیش کردەوەی نادروست و ناپەسەندیانی بۆ رازاندبوونەوە، لە رێگەو رێبازی راست و دروست وێڵی کردبوون، لەکاتێکدا ئەوان خاوەنی عەقڵ و بیرو هۆشیش بوون.

وَقَٰرُونَ وَفِرْعَوْنَ وَهَٰمَٰنَ ۖ وَلَقَدْ جَآءَهُم مُّوسَىٰ بِٱلْبَيِّنَٰتِ فَٱسْتَكْبَرُوا۟ فِى ٱلْأَرْضِ وَمَا كَانُوا۟ سَٰبِقِينَ ﴿٣٩﴾ فَكُلًّا أَخَذْنَا بِذَنۢبِهِۦ ۖ فَمِنْهُم مَّنْ أَرْسَلْنَا عَلَيْهِ حَاصِبًا وَمِنْهُم مَّنْ أَخَذَتْهُ ٱلصَّيْحَةُ وَمِنْهُم مَّنْ خَسَفْنَا بِهِ ٱلْأَرْضَ وَمِنْهُم مَّنْ أَغْرَقْنَا ۚ وَمَا كَانَ ٱللَّهُ لِيَظْلِمَهُمْ وَلَٰكِن كَانُوٓا۟ أَنفُسَهُمْ يَظْلِمُونَ ﴿٤٠﴾ مَثَلُ ٱلَّذِينَ ٱتَّخَذُوا۟ مِن دُونِ ٱللَّهِ أَوْلِيَآءَ كَمَثَلِ ٱلْعَنكَبُوتِ ٱتَّخَذَتْ بَيْتًا ۖ وَإِنَّ أَوْهَنَ ٱلْبُيُوتِ لَبَيْتُ ٱلْعَنكَبُوتِ ۖ لَوْ كَانُوا۟ يَعْلَمُونَ ﴿٤١﴾ إِنَّ ٱللَّهَ يَعْلَمُ مَا يَدْعُونَ مِن دُونِهِۦ مِن شَىْءٍ ۚ وَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ ﴿٤٢﴾ وَتِلْكَ ٱلْأَمْثَٰلُ نَضْرِبُهَا لِلنَّاسِ ۖ وَمَا يَعْقِلُهَآ إِلَّا ٱلْعَٰلِمُونَ ﴿٤٣﴾ خَلَقَ ٱللَّهُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ بِٱلْحَقِّ ۚ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَةً لِّلْمُؤْمِنِينَ ﴿٤٤﴾ ٱتْلُ مَآ أُوحِىَ إِلَيْكَ مِنَ ٱلْكِتَٰبِ وَأَقِمِ ٱلصَّلَوٰةَ ۖ إِنَّ ٱلصَّلَوٰةَ تَنْهَىٰ عَنِ ٱلْفَحْشَآءِ وَٱلْمُنكَرِ ۗ وَلَذِكْرُ ٱللَّهِ أَكْبَرُ ۗ وَٱللَّهُ يَعْلَمُ مَا تَصْنَعُونَ ﴿٤٥﴾

(٣٩) قاروون و فیرعەون و هامانیشمان لەناو برد، سوێند بە خوا بێگومان موسا بەڵگەی زۆری بۆ هێنان، کەچی خۆیان زۆر بەگەورە دانا لە زەویدا، سەرئەنجام نەیانتوانی لە سزاو تۆڵەی خوا خۆیان رزگار بکەن.

(٤٠) ئێمە هەریەکێک یان هەر دەستەیەک لەوانەمان بەسزای تاوانی خۆی گەیاند، جا هەیانبوو بەرد بارانمان کرد، هەیانبوو دەنگ و سەدای بەهێز لەناوی برد، هەیانبوو بەناخی زەویدا بردمانە خوارەوە، هەشیانبوو نوقمی دەریامان کرد، جا وەنەبێت خوا ستەمی لێکرد بن، بەڵکو خۆیان ستەمیان لە خۆیان دەکرد.

(٤١) نموونەی ئەوانەی جگە لە خوای گەورە، کەسانێکی تر دەکەنە پشتیوانی خۆیان، وەک نموونەی جاڵجاڵۆکەیەک وایە کە ماڵێکی بۆ خۆی ساز کردبێت، بەڕاستی لاوازترینی هەموو ماڵەکان؛ ماڵی جاڵجاڵۆکەیە ئەگەر سەرنجیان بدایە و تێبگەیشتنایە (چونکە ماڵی جاڵجاڵۆکە نە بناغە و نە دیواری هەیە، نە سەرو دەرگا و پەنجەرە، نەدەتوانێت بەرگەی با و باران و ڕووداوەکان بگرێت مێیەکەش نێرەکە لەناو دەبات دوای جووت بوون، پاشان بێچوەکانیش دایکیان لەناو دەبەن)!!!

(٤٢) بێگومان خوا خۆی چاک دەزانێت ئەوەی ئەو خەڵکە هاناو هاواری بۆ دەبەن لەجیاتی ئەو، چەندە بێ دەسەڵاتن، چونکە هەر خۆی خاوەن دەسەڵاتە و زۆریش دانایە (لەو بوارەی کە بۆ تاقیکردنەوەی خەڵکی رەخساندویەتی).

(٤٣) ئا ئەم نموونانە ئێمە دەیهێنینەوە بۆ خەڵکی، تەنها زانا و شارەزاکان تێی دەگەن و تێ دەفکرن.

(٤٤) ئاشکرایە خوا ئاسمانەکان و زەوی بە ڕێک و پێکترین شێوە دروست کردووە، بەڕاستی ئا لەو کارەدا بەڵگە و نیشانەی تەواو هەیە بۆ ئیمانداران.

(٤٥) ئەی پێغەمبەر ﷺ ئەوەی بۆت ڕەوانە دەکرێت لە قورئان بیخوێنەرەوە و نوێژیش بەچاکی ئەنجام بدە، چونکە بەڕاستی نوێژ بەرهەڵستی لە گوناهو تاوان و نادروستی دەکات، بێگومان یادی خوا لە هەموو شت گەورەتر و بە نرختره (کە دەبێت لەکاتی نوێژ و کاتی تریشدا بیرو هۆشی ئیماندار، دابگرێت) و خوا خۆی زانایە بەهەموو ئەو کارو کردەوانەی کە ئەنجامی دەدەن.



﴿وَلَا تُجَٰدِلُوٓاْ أَهۡلَ ٱلۡكِتَٰبِ إِلَّا بِٱلَّتِي هِيَ أَحۡسَنُ إِلَّا ٱلَّذِينَ ظَلَمُواْ مِنۡهُمۡۖ وَقُولُوٓاْ ءَامَنَّا بِٱلَّذِيٓ أُنزِلَ إِلَيۡنَا وَأُنزِلَ إِلَيۡكُمۡ وَإِلَٰهُنَا وَإِلَٰهُكُمۡ وَٰحِدٞ وَنَحۡنُ لَهُۥ مُسۡلِمُونَ ٤٦ وَكَذَٰلِكَ أَنزَلۡنَآ إِلَيۡكَ ٱلۡكِتَٰبَۚ فَٱلَّذِينَ ءَاتَيۡنَٰهُمُ ٱلۡكِتَٰبَ يُؤۡمِنُونَ بِهِۦۖ وَمِنۡ هَٰٓؤُلَآءِ مَن يُؤۡمِنُ بِهِۦۚ وَمَا يَجۡحَدُ بِـَٔايَٰتِنَآ إِلَّا ٱلۡكَٰفِرُونَ ٤٧ وَمَا كُنتَ تَتۡلُواْ مِن قَبۡلِهِۦ مِن كِتَٰبٖ وَلَا تَخُطُّهُۥ بِيَمِينِكَۖ إِذٗا لَّٱرۡتَابَ ٱلۡمُبۡطِلُونَ ٤٨ بَلۡ هُوَ ءَايَٰتُۢ بَيِّنَٰتٞ فِي صُدُورِ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡعِلۡمَۚ وَمَا يَجۡحَدُ بِـَٔايَٰتِنَآ إِلَّا ٱلظَّٰلِمُونَ ٤٩ وَقَالُواْ لَوۡلَآ أُنزِلَ عَلَيۡهِ ءَايَٰتٞ مِّن رَّبِّهِۦۚ قُلۡ إِنَّمَا ٱلۡأٓيَٰتُ عِندَ ٱللَّهِ وَإِنَّمَآ أَنَا۠ نَذِيرٞ مُّبِينٌ ٥٠ أَوَلَمۡ يَكۡفِهِمۡ أَنَّآ أَنزَلۡنَا عَلَيۡكَ ٱلۡكِتَٰبَ يُتۡلَىٰ عَلَيۡهِمۡۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَرَحۡمَةٗ وَذِكۡرَىٰ لِقَوۡمٖ يُؤۡمِنُونَ ٥١ قُلۡ كَفَىٰ بِٱللَّهِ بَيۡنِي وَبَيۡنَكُمۡ شَهِيدٗاۖ يَعۡلَمُ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۗ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ بِٱلۡبَٰطِلِ وَكَفَرُواْ بِٱللَّهِ أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡخَٰسِرُونَ ٥٢﴾

(٤٦) گفتوگۆو (مجادلة) مەكەن لەگەڵ خاوەنی كتێبە ئاسمانیەكاندا مەگەر بەجوانترین شێوە نەبێت، جگە لەوانەیان كە ستەمیان كردووە (ئەوە رەفتارتان لە بەرامبەریانەوە دەبێت جیاواز بێت) پێشیان بڵێن: ئێمە باوەڕمان هێناوە بەوەی بۆ ئێمە و ئێوە دابەزێنراوە، خوای ئێمە و خوای ئێوە تەنها یەكێكە، ئێمە فەرمانبەرداری ئەو زاتەین.

(٤٧) ئەی پێغەمبەر ﷺ هەر بە شێوەی كتێبەكانی پێشوو ئێمە قورئانمان بۆ دابەزاندوویت، جا ئەوانەی كتێبمان پێداون و بە راستی خوێندوویانەتەوە، ئەوە باوەڕ دەهێنن بە قورئان وهەندێك لەو خەڵكەی تریش هەن باوەڕ دەهێنن پێی و موسڵمان دەبن، جا كەس نیە نینكاری ئایەت و بەڵگە و نیشانەی ئێمە بكات (دوای لابردنی گومان) جگە لە خوانەناسان.

(٤٨) تۆ ئەی پێغەمبەر ﷺ پێش ناردنی ئەم قورئانە هیچ كتێبێكت نەدەخوێندەوە، بە دەستی خۆیشت هیچ شتێكت نەنووسیوە، (چونكە نەخوێندەوار بوویت) خۆ ئەگەر شتێكی وات ئەنجام بدایە، لەو كاتەدا نەفام و دەم بەتاڵەكان دنیایان پڕ دەكرد لە شك وگومان (كە گوایە قورئان لە دانان و داڕشتنی تۆیە).

(٤٩) نەخێر هی تۆ نیە، بەڵكو قورئان چەند ئایەتێكی روون و ئاشكران لە سینەو دڵ و دەروونی ئەو كەسانەدا عیلم و زانستیان پێبەخشراوە و لەبەریانە، بەڕاستی جگە لە ستەمكاران، كەس بەرهەڵستی و نكوڵی لە ئایەتەكانی ئێمە نیە.

(٥٠) كافران (وادیارە قورئان بە بەڵگە دانانێن بۆیە) دەڵێن: باشە چی دەبوو؛ ئەگەر نیشانە و بەڵگەی لەلایەن پەروەردگاریەوە بۆ رەوانە بكرایە، تۆش ئەی پێغەمبەر لە وەڵامیاندا بڵێ: موعجیزە و نیشانە و بەڵگە ماددیەكان بەدەست خوا خۆیەتی و من تەنها ئاگاداركەرەوە و بێداركەرەوەیەكی ئاشكرام بۆتان.

(٥١) ئایا بەس نیە بۆیان كە بەڕاستی ئێمە قورئانمان دابەزاندووە بۆت و بەسەریاندا دەخوێنرێتەوە، بێگومان ئا لەو قورئانەدا رەحمەت و یادەوەری ئاشكرا هەیە بۆ ئەو كەسانەی كە ئیمان دەهێنن.

(٥٢) (لەوەودوا ئەی پێغەمبەر ﷺ) پێیان بڵێ: تەنها خوا بەسە شایەت بێت لە نێوانماندا (كە من پەیامەكەیم پێ راگەیاندوون)، جا هەر ئەو زاتە زاناو ئاگایە بەهەرچی لە ئاسمانەكان و زەویدا هەیە، ئەوانەش باوەڕ بە ناحەق و بەتاڵ هێناوە و باوەڕیان بەخوای (تاك و تەنها) نەهێناوە، ئا ئەوانە هەر خۆیان خەسارەتمەند و زەرەرمەندن.

وَيَسْتَعْجِلُونَكَ بِالْعَذَابِ ۚ وَلَوْلَا أَجَلٌ مُّسَمًّى لَّجَاءَهُمُ الْعَذَابُ وَلَيَأْتِيَنَّهُم بَغْتَةً وَهُمْ لَا يَشْعُرُونَ ﴿٥٣﴾ يَسْتَعْجِلُونَكَ بِالْعَذَابِ وَإِنَّ جَهَنَّمَ لَمُحِيطَةٌ بِالْكَافِرِينَ ﴿٥٤﴾ يَوْمَ يَغْشَاهُمُ الْعَذَابُ مِن فَوْقِهِمْ وَمِن تَحْتِ أَرْجُلِهِمْ وَيَقُولُ ذُوقُوا مَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴿٥٥﴾ يَا عِبَادِيَ الَّذِينَ آمَنُوا إِنَّ أَرْضِي وَاسِعَةٌ فَإِيَّايَ فَاعْبُدُونِ ﴿٥٦﴾ كُلُّ نَفْسٍ ذَائِقَةُ الْمَوْتِ ۖ ثُمَّ إِلَيْنَا تُرْجَعُونَ ﴿٥٧﴾ وَالَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ لَنُبَوِّئَنَّهُم مِّنَ الْجَنَّةِ غُرَفًا تَجْرِي مِن تَحْتِهَا الْأَنْهَارُ خَالِدِينَ فِيهَا ۚ نِعْمَ أَجْرُ الْعَامِلِينَ ﴿٥٨﴾ الَّذِينَ صَبَرُوا وَعَلَىٰ رَبِّهِمْ يَتَوَكَّلُونَ ﴿٥٩﴾ وَكَأَيِّن مِّن دَابَّةٍ لَّا تَحْمِلُ رِزْقَهَا اللَّهُ يَرْزُقُهَا وَإِيَّاكُمْ ۚ وَهُوَ السَّمِيعُ الْعَلِيمُ ﴿٦٠﴾ وَلَئِن سَأَلْتَهُم مَّنْ خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ وَسَخَّرَ الشَّمْسَ وَالْقَمَرَ لَيَقُولُنَّ اللَّهُ ۖ فَأَنَّىٰ يُؤْفَكُونَ ﴿٦١﴾ اللَّهُ يَبْسُطُ الرِّزْقَ لِمَن يَشَاءُ مِنْ عِبَادِهِ وَيَقْدِرُ لَهُ ۚ إِنَّ اللَّهَ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمٌ ﴿٦٢﴾ وَلَئِن سَأَلْتَهُم مَّن نَّزَّلَ مِنَ السَّمَاءِ مَاءً فَأَحْيَا بِهِ الْأَرْضَ مِن بَعْدِ مَوْتِهَا لَيَقُولُنَّ اللَّهُ ۚ قُلِ الْحَمْدُ لِلَّهِ ۚ بَلْ أَكْثَرُهُمْ لَا يَعْقِلُونَ ﴿٦٣﴾

(٥٣) بێ باوەڕان پەلەت لێ دەکەن و داوای هاتنی سزات لێ دەکەن، خۆ ئەگەر کاتی تایبەتیمان دیاری نەکردایە بۆ پێشهاتنی، یەکسەر سزایان بۆ دەهات، بێگومان ئەو سزاو تۆڵەیە، لە ناکاو یەخەیان پێدەگرێت و لەکاتێکدا ئەوان هەست بە نزیک بوونەوەشی ناکەن.

(٥٤) بێ باوەڕان پەلەت لێ دەکەن و داوای هاتنی سزات لێدەکەن، بێگومانیش دۆزەخ دەوری کافرانی داوەو هەرگیز لە سزای دەرباز نابن...

(٥٥) لەرۆژێکدا کە سزا دایاندەگرێت لە سەرویانەوە، لە ژێر پێیانەوە خوای گەورە پێیان دەفەرموێت: بچێژن سەرئەنجامی ئەو کارو کردەوانەی کە ئەنجامتان دەدا.

(٥٦) (پەروەردگار بەئیماندارانی بەگیرهاتوو لەناو کافراندا رادەگەیەنێت): ئەی بەندەکانم زەوی من فراوانە، مۆڵکی من بەربلاوە (کۆچ بکەن، خۆتان رزگار بکەن)، تەنها هەر من بپەرستن.

(٥٧) (لەوانەیە ترسی مەرگ لە ئارادا هەبێت بۆیە ترسیان دەڕەوێنێتەوە و دەفەرموێت): هەموو کەس دەبێت مردن بچێژێت (کەی، لە کوێ، بەچی، خوا نەبێت کەس نازانێت) لەوەودوا تەنها بۆ لای دەبرێنەوە.

(٥٨) جا ئەوانەی کە ئیمان و باوەڕیان هێناوە و کارو کردەوە چاکەکانیان ئەنجامداوە، سوێند بە خوا ئەوانە لە بەهەشتدا لە چەندەها کۆشک و تەلارو ژووری بەرزدا دادەبەزێنین، کە چەندەها رووبارو تافگە بەژێر درەختەکانیدا و بە بەردەم کۆشک و تەلارەکانیدا دەڕوات، (ئەو بەختەوەرانە) ژیانی ئەبڕاوە لەو (شوێنە خۆشانەدا) دەبەنە سەر، ئای چەند جوانە پاداشتی ئیشکەران بۆ خوا ...

(٥٩) ئەوانەن خۆگربوون لەبەردەم ئەشکەنجە و ئازاری بێباوەڕاندا و هەر پشت بە پەروەردگاریان دەبەستن ...

(٦٠) (هەروەها خوای گەورە دەیەوێت لە گیروگرفتی رزق و رۆزیش دڵنیایان بکات؛ بۆیە دەفەرموێت): زۆر زیندەوەر هەیە رزق و رۆزی خۆیان نەداوە بەکۆڵی خۆیاندا (کەچی خوا پەکیان ناخات و لە برساندا نامرن)، چونکە خوا رزقی ئەوانیش و ئێوەیش دەدات، بێگومان ئەوزاتە بیسەر(بە قسە و گوفتارتان) و زانایە (بەخەیاڵی دڵ و دەروونتان).

(٦١) سوێند بە خوا ئەگەر پرسیار لە بێباوەڕان بکەیت: کێ ئاسمانەکان و زەوی دروست کردووە، رۆژو مانگی رام کردووە، بەدڵنیایی و بێ دوودڵی دەڵێن: (الله) دروستی کردوون، جا چۆن لادەدرێن لە یەکتاپەرستی و فریو دەخۆن؟!

(٦٢) هەر خوایە رزق و رۆزی دەبەخشێت بە هەر کام کە بیەوێت لە بەندەکانی، یان دەیگرێتەوە و کەمی دەکاتەوە (بۆ تاقی کردنەوە)، بەڕاستی خوا خۆی بەهەموو شتێک زاناو ئاگایە (دەزانێت چ حاڵەتێک چاک و لەبارە بۆ هەر بەندەیەک).

(٦٣) خۆ ئەگەر لێیان بپرسیت: کێ ئاو لە ئاسمانەوە دەبارێنێت، جا زەوی پێ دەبوژێنێتەوە، دوای ئەوەی خامۆش و مردوو بوو، ئەوە بەدڵنیاییەوە دەڵێن..(الله) (تۆ ئەی پێغەمبەرﷺ، ئەی ئیماندار) بڵێ: سوپاس بۆ خوا، کە ئاوا، دان بە دەسەڵاتیدا دەنێن، ئەخێر بەڕاستیان نییە، بەڵکو هێشتا زۆربەیان بێ بیرو هۆشن و ژیریان ناخەنەکار.

وَمَا هَٰذِهِ ٱلْحَيَوٰةُ ٱلدُّنْيَآ إِلَّا لَهْوٌ وَلَعِبٌ ۚ وَإِنَّ ٱلدَّارَ ٱلْءَاخِرَةَ لَهِىَ ٱلْحَيَوَانُ ۚ لَوْ كَانُوا۟ يَعْلَمُونَ ﴿٦٤﴾ فَإِذَا رَكِبُوا۟ فِى ٱلْفُلْكِ دَعَوُا۟ ٱللَّهَ مُخْلِصِينَ لَهُ ٱلدِّينَ فَلَمَّا نَجَّىٰهُمْ إِلَى ٱلْبَرِّ إِذَا هُمْ يُشْرِكُونَ ﴿٦٥﴾ لِيَكْفُرُوا۟ بِمَآ ءَاتَيْنَٰهُمْ وَلِيَتَمَتَّعُوا۟ ۖ فَسَوْفَ يَعْلَمُونَ ﴿٦٦﴾ أَوَلَمْ يَرَوْا۟ أَنَّا جَعَلْنَا حَرَمًا ءَامِنًا وَيُتَخَطَّفُ ٱلنَّاسُ مِنْ حَوْلِهِمْ ۚ أَفَبِٱلْبَٰطِلِ يُؤْمِنُونَ وَبِنِعْمَةِ ٱللَّهِ يَكْفُرُونَ ﴿٦٧﴾ وَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّنِ ٱفْتَرَىٰ عَلَى ٱللَّهِ كَذِبًا أَوْ كَذَّبَ بِٱلْحَقِّ لَمَّا جَآءَهُۥٓ ۚ أَلَيْسَ فِى جَهَنَّمَ مَثْوًى لِّلْكَٰفِرِينَ ﴿٦٨﴾ وَٱلَّذِينَ جَٰهَدُوا۟ فِينَا لَنَهْدِيَنَّهُمْ سُبُلَنَا ۚ وَإِنَّ ٱللَّهَ لَمَعَ ٱلْمُحْسِنِينَ ﴿٦٩﴾




بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

الٓمٓ ﴿١﴾ غُلِبَتِ ٱلرُّومُ ﴿٢﴾ فِىٓ أَدْنَى ٱلْأَرْضِ وَهُم مِّنۢ بَعْدِ غَلَبِهِمْ سَيَغْلِبُونَ ﴿٣﴾ فِى بِضْعِ سِنِينَ ۗ لِلَّهِ ٱلْأَمْرُ مِن قَبْلُ وَمِنۢ بَعْدُ ۚ وَيَوْمَئِذٍ يَفْرَحُ ٱلْمُؤْمِنُونَ ﴿٤﴾ بِنَصْرِ ٱللَّهِ ۚ يَنصُرُ مَن يَشَآءُ ۖ وَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلرَّحِيمُ ﴿٥﴾



(٦٤) ژیانی ئەم دنیایە جگە لە گەمە و گاڵتە و یاری شتێکی تر نیە.. (واتە بێ نرخە و ئەوە ناژی خەڵکی ناوا پەلاماری دەدەن و ستەم لە پێناویدا دەکەن) بەڕاستی ماڵی قیامەتیش و ژیانی ناو بەهەشت، هەر ئەوە ژیانە (شایستەی ئەوەیە کە ئادەمیزاد هەوڵ و کۆششی بۆ بدات)، ئەگەر بیانزانیایە و تێبگەیشتنایە.

(٦٥) هەر کاتێک خەڵکی (باوەڕ لاواز) سواری کەشتی دەبن، مەترسی نوقم بوون و تیاچوون ڕوویان تێدەکات، زۆر بەکوڵ، هاناو هاوار بۆ خوا دەبەن و بە دڵسۆزی و ملکەچیەوە باوەڕ دەهێنن، بەڵام کاتێک خوا ڕزگاریان دەکات و دەگەنەوە وشکانی دەستبەجێ لە ڕێبازی یەکتاپەرستی دەترازێن و هاوەڵ و هاوبەش بۆ خوا بڕیار دەدەن.

(٦٦) جا با ئەوانە هەر ناشوکرو بەدنمەک بن لە بەرامبەر ئەو هەموو بەخششانەی ئێمەوە، با نازو نیعمەتەکانی خوا بەکار بهێنن بەو شێوازەی کە پێی ڕازی نیە، سەرەنجام لە داهاتوودا خۆیان دەبیننەوە و بەئاگا دێنەوە..!

(٦٧) (باشە، خوانەناسانی مەککە) هەست ناکەن، نابینن کە چۆن شوێنێکی ئەمین و پڕ لە ئاسایشمان بۆ فەراهەم هێناون لەکاتێکدا، لە دەوروبەریانەوە خەڵکی دەفڕێنرێت، ئایا هەر باوەڕ بە بەتاڵ و ناحەقی دەهێنن و هەست بە نازو نیعمەتەکانی خوا ناکەن و سپڵەیی دەکەن؟!

(٦٨) جا ئیتر کێ لەوە ستەمکارترە کە درۆ هەڵدەبەستێت و هاوەڵی بۆ بڕیار دەدات، یان ئەو حەق و ڕاستیەی کە بۆی هاتووە بە درۆی دەزانێت، مەگەر هەر دۆزەخ شایستە بێت، ئایا لە دۆزەخدا جێگە و ڕێگەیەکی هەمیشەیی بۆ بێباوەڕان دابین نەکراوە؟ (بێگومان ئامادە کراوە).

(٦٩) ئەوانەش لە پێناوی ئێمەداو بۆ بەدەستهێنانی ڕەزامەندی ئێمە؛ هەوڵ و کۆششیان کردووە و خۆیان ماندوو کردووە، سوێند بەخوا بەڕاستی ئەوانە ڕێنموویی دەکەین بۆ هەموو ڕێگەیەکی چاک و دروستی خۆمان (کە بەدەستهێنانی ڕەزامەندی ئێمەی لەدوایە)، بێگومان خوای پەروەردگار هەمیشە لەگەڵ چاکەکارانە.

سورەتی (الروم)

بەناوی خوای بەخشندە و میهرەبان

(١) سەرنجی سەرەتای سوورەتی (البقرة) بدە.

(٢) ڕۆمەکان تێکشکێنران (بەدەستی فارسەکان).

(٣) لە نزیکترین و نزمترین وڵاتیاندا، بەڵام لە ئایندەدا (نۆرەیان دێتەوە) ڕۆمەکان دوای شکستیان سەردەکەونەوە.

(٤) لە چەند ساڵێکدا (چەند ساڵێکی داهاتوو نێوان ٣-٩ ساڵ)، هەموو کارو فرمانێک تەنها بەدەست خوایە، لەوەو پێش و لەوە و دوایش (لە هەموو کات و هەموو شوێنێک)، جا ئەو ڕۆژە ئیمانداران خۆشحاڵ و شاد دەبن...

(٥) بە سەرکەوتنی خوا، (کە بەخشی بە ئیمانداران و بە ڕۆمەکان)، هەر کەسێک یان هەر دەستەیەک ئەو زاتە بیەوێت، سەری دەخات، هەر ئەو خوایەش خاوەنی دەسەڵاتی بێسنوورە و زۆریش دلۆڤان و میهرەبانە.

وَعۡدَ ٱللَّهِۖ لَا يُخۡلِفُ ٱللَّهُ وَعۡدَهُۥ وَلَٰكِنَّ أَكۡثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعۡلَمُونَ ﴿٦﴾ يَعۡلَمُونَ ظَٰهِرٗا مِّنَ ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا وَهُمۡ عَنِ ٱلۡأٓخِرَةِ هُمۡ غَٰفِلُونَ ﴿٧﴾ أَوَلَمۡ يَتَفَكَّرُواْ فِيٓ أَنفُسِهِمۗ مَّا خَلَقَ ٱللَّهُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَ وَمَا بَيۡنَهُمَآ إِلَّا بِٱلۡحَقِّ وَأَجَلٖ مُّسَمّٗىۗ وَإِنَّ كَثِيرٗا مِّنَ ٱلنَّاسِ بِلِقَآيِٕ رَبِّهِمۡ لَكَٰفِرُونَ ﴿٨﴾ أَوَلَمۡ يَسِيرُواْ فِي ٱلۡأَرۡضِ فَيَنظُرُواْ كَيۡفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِهِمۡۚ كَانُوٓاْ أَشَدَّ مِنۡهُمۡ قُوَّةٗ وَأَثَارُواْ ٱلۡأَرۡضَ وَعَمَرُوهَآ أَكۡثَرَ مِمَّا عَمَرُوهَا وَجَآءَتۡهُمۡ رُسُلُهُم بِٱلۡبَيِّنَٰتِۖ فَمَا كَانَ ٱللَّهُ لِيَظۡلِمَهُمۡ وَلَٰكِن كَانُوٓاْ أَنفُسَهُمۡ يَظۡلِمُونَ ﴿٩﴾ ثُمَّ كَانَ عَٰقِبَةَ ٱلَّذِينَ أَسَٰٓـُٔواْ ٱلسُّوٓأَىٰٓ أَن كَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ وَكَانُواْ بِهَا يَسۡتَهۡزِءُونَ ﴿١٠﴾ ٱللَّهُ يَبۡدَؤُاْ ٱلۡخَلۡقَ ثُمَّ يُعِيدُهُۥ ثُمَّ إِلَيۡهِ تُرۡجَعُونَ ﴿١١﴾ وَيَوۡمَ تَقُومُ ٱلسَّاعَةُ يُبۡلِسُ ٱلۡمُجۡرِمُونَ ﴿١٢﴾ وَلَمۡ يَكُن لَّهُم مِّن شُرَكَآئِهِمۡ شُفَعَٰٓؤُاْ وَكَانُواْ بِشُرَكَآئِهِمۡ كَٰفِرِينَ ﴿١٣﴾ وَيَوۡمَ تَقُومُ ٱلسَّاعَةُ يَوۡمَئِذٖ يَتَفَرَّقُونَ ﴿١٤﴾ فَأَمَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ فَهُمۡ فِي رَوۡضَةٖ يُحۡبَرُونَ ﴿١٥﴾

بێگومان ئەوە بەڵێنی خوا خۆیەتی (کە ئیمانداران و ڕۆمەکان سەردەخات بەسەر فارسەکاندا)، خوا سەرپێچی ناکات لە بەڵێنەکەی، بەلام زۆربەی خەڵکی تەنها ڕواڵەت لە دنیا دەزانن (عەقڵیان لە چاویاندایە)، ئەوانە بێئاگا و بێخەبەرن لە ڕۆژی دوایی و قیامەت...

(٧) ئەوانە هەر ڕواڵەت لە ژیانی دنیا بەدی دەکەن، لە بەرامبەر قیامەتیشەوە بێ ئاگان.

(٨) ئایا ئەوە لە ناخی خۆیاندا بیریکیان نەکردۆتەوە، کە خوا ئاسمانەکان و زەوی و هەرچی لە نێوانیاندا هەیە تەنها بە حەق و سنووردار نەبێت دروستی نەکردوون؟ لە ڕاستیدا زۆربەی خەڵکی بێباوەڕن بە گەیشتنە خزمەتی پەروەردگاریان.

(٩) ئایا بەسەر زەویدا نەگەڕاون، تا تەماشا بکەن و سەرنج بدەن چیمان بەسەر ئەو نەتەوانەی پێش ئەماندا هێناوە، لەمان زۆر بەهێزترو بە دەسەلات تر بوون، زەویان ژێرەو ژوور دەکرد (واتە دەیان کێلا بۆ کشتوکاڵ و کانزایان لێ دەردەهێنا) و ئاوەدانیان کردبۆوە زیاتر لەمان، پێغەمبەرەکانیشیان کاتی خۆی بەڵگەی زۆر و ئاشکرایان بۆ هێنان؟ (بەلام بێسوود بوو، زۆربەیان بڕوایان نەکرد) جا وەنەبێت خوا ستەمی لێکردبن، بەڵکو هەر خۆیان ستەمیان لە خۆیان دەکرد.

(١٠) پاشان ئەو تیاچوونە سەرئەنجامی ئەوانە بوو کە تاوان و گوناهیان کرد؛ چونکە ئەوانە بڕوایان بە ئایەت و فەرمانەکانی خوا نەهێنا و گاڵتەیان پێ دەکرد.

هەرخوا خۆی دروستکراوان دەهێنێتە مەیدان و دوایی وەک خۆیان لێدەکاتەوە، (سەرەتا هەر ئەو دروستی کردوون و هەر ئەویش دوای مردن دووبارە زیندوویان دەکاتەوە)، سەرئەنجامیش هەر بۆ لای ئەو زاتە دەبرێنەوە.

(١٢) ئەو ڕۆژەی قیامەت بەرپا دەبێت، تاوانباران و تاوانکاران نائومێد و بێ هیوا دەبن (چونکە دەزانن چیان چاندووەو چیان کێڵاوە و چیان دەست پێشکەری کردوە).

کەسیان دەست نەکەوت لەوانەی بە شەریک و هاوەڵیان دەزانی تا تکایان بۆ بکات و فریایان بکەوێت، ئەوسا ئیتر بەناچاری، بێ باوەڕ دەبن بە شەریک و هاوەڵ (کە لە دنیادا پشتیان پێ دەبەستن و هانا و هاواریان بۆ دەبردن).

ئەو ڕۆژەی قیامەت بەرپا دەبێت، لەو ڕۆژەدا؛ ئەو خەڵکە؛ لە یەک دادەبڕێن و دەبنە دوو دەستەوە.

جا ئەوانەی باوەڕیان هێناوە و کردەوە چاکەکانیان ئەنجامداوە، ئەوانە لە باخچەو باخاتی بەهەشتدا ژیانی پڕ لە کامەرانی و بەختەوەری و ئاسوودەیی شاد دەکرێن.

وَأَمَّا ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ وَكَذَّبُواْ بِـَٔايَـٰتِنَا وَلِقَآيِٕ ٱلۡأٓخِرَةِ فَأُوْلَـٰٓئِكَ فِي ٱلۡعَذَابِ مُحۡضَرُونَ ﴿١٦﴾ فَسُبۡحَـٰنَ ٱللَّهِ حِينَ تُمۡسُونَ وَحِينَ تُصۡبِحُونَ ﴿١٧﴾ وَلَهُ ٱلۡحَمۡدُ فِي ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ وَعَشِيّٗا وَحِينَ تُظۡهِرُونَ ﴿١٨﴾ يُخۡرِجُ ٱلۡحَيَّ مِنَ ٱلۡمَيِّتِ وَيُخۡرِجُ ٱلۡمَيِّتَ مِنَ ٱلۡحَيِّ وَيُحۡيِ ٱلۡأَرۡضَ بَعۡدَ مَوۡتِهَاۚ وَكَذَٰلِكَ تُخۡرَجُونَ ﴿١٩﴾ وَمِنۡ ءَايَـٰتِهِۦٓ أَنۡ خَلَقَكُم مِّن تُرَابٖ ثُمَّ إِذَآ أَنتُم بَشَرٞ تَنتَشِرُونَ ﴿٢٠﴾ وَمِنۡ ءَايَـٰتِهِۦٓ أَنۡ خَلَقَ لَكُم مِّنۡ أَنفُسِكُمۡ أَزۡوَٰجٗا لِّتَسۡكُنُوٓاْ إِلَيۡهَا وَجَعَلَ بَيۡنَكُم مَّوَدَّةٗ وَرَحۡمَةًۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَـٰتٖ لِّقَوۡمٖ يَتَفَكَّرُونَ ﴿٢١﴾ وَمِنۡ ءَايَـٰتِهِۦ خَلۡقُ ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ وَٱخۡتِلَـٰفُ أَلۡسِنَتِكُمۡ وَأَلۡوَٰنِكُمۡۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَـٰتٖ لِّلۡعَـٰلِمِينَ ﴿٢٢﴾ وَمِنۡ ءَايَـٰتِهِۦ مَنَامُكُم بِٱلَّيۡلِ وَٱلنَّهَارِ وَٱبۡتِغَآؤُكُم مِّن فَضۡلِهِۦٓۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَـٰتٖ لِّقَوۡمٖ يَسۡمَعُونَ ﴿٢٣﴾ وَمِنۡ ءَايَـٰتِهِۦ يُرِيكُمُ ٱلۡبَرۡقَ خَوۡفٗا وَطَمَعٗا وَيُنَزِّلُ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءٗ فَيُحۡيِۦ بِهِ ٱلۡأَرۡضَ بَعۡدَ مَوۡتِهَآۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَـٰتٖ لِّقَوۡمٖ يَعۡقِلُونَ ﴿٢٤﴾

(١٦) ئەوانەش بێ بڕوا بوون، کاتی خۆی بەڵگە و نیشانەکانی ئێمەیان بەدرۆ دەزانی و بڕوایان بەگەیشتنی قیامەت و زیندوو بوونەوە نەبوو، ئەوانە ئامادەن لەناو سزایەکی سەخت و دۆزەخێکی پڕ ئەشکەنجە و ئازاردا.

(١٧) کەواتە پاکی و بێگەردی و ستایش بۆ خوا، کاتێک کە ئێوارە و بەیانی دەکەنەوە.

(١٨) شوکرو سوپاسگوزاری هەر شایستەی زاتی خوایە لە ئاسمانەکان و زەویدا، لەکاتی عیشاو تاریکیدا، هەروەها کاتێک کە نیوەڕۆ دەکەنەوە.

(١٩) ئەو خوایە زیندوو لە مردوو دەردەهێنێت (لە مادده بێ گیانەکان زیندەوەران دروست دەکات)، مردوویش لە زیندو دەردەهێنێت (ژیان و مردن بەردەوامە و تێهەڵکێشی یەکن)، زەوی دوای مردنی زیندو دەکاتەوە (زەوی لە وەرزی پایز و زستاندا جۆرە مردنێکی بەسەردا دێت، لە وەرزی بەهارو هاویندا جۆرە زیندوو بوونەوەیەکی تێدا ئاشکرایە)، جا هەر ئا بەو شێوەیە ئێوەش لە گۆڕەکان دەردەهێنرێنەوە. (لەوە دەچێت وەکو زۆربەی زانایان دەفەرموون: زیندوو بوونەوەی دووەم جار وێنەی ڕوەک لەم خاکە سەردەربهێنین).

(٢٠) لە نیشانە و بەڵگەکانی خوا ئەوەیە ئێوەی لە خاک دروست کردووە، لەوەودوا دوای بڕینی چەند قۆناغێک کوتوپڕ بوونەتە مرۆڤێک و بلاو دەبنەوە بە زەویدا.

(٢١) یەکێک لە نیشانە و بەڵگەکانی تری ئەوەیە: کە هەر لە خۆتان هاوسەری بۆ دروست کردوون بۆ ئەوەی ئارام بگرن لەلایداو لە نێوانتاندا خۆشەویستی و سۆزو میهرەبانی فەراهەم هێناوە، بەڕاستی ئا لەو دیاردانەدا نیشانە و بەڵگە هەیە بۆ کەسانێک بیردەکەنەوە و تێدەفکرن.

(٢٢) (یەکێکی تر) لە نیشانە و بەڵگەکانی، دروستکردنی ئاسمانەکان و زەویە (کە زاناکانی ئەستێرەناسی لە ئاستیدا سەرسام و سەرگەردانن) و جیاوازی زمان و ڕەنگتانە (دەنگی هیچ کەس لە کەسی تر ناکات، سەرەڕای سەدەها جۆر زمان، کە جۆری قسەکردن و داڕشتنی هەر گەلێک تایبەتمەندی خۆی هەیە، جگە لە هەزاران شێواز کە لەو زمانە سەرەکیانە دەبێتەوە)، بەڕاستی ئا لەو دیاردەیەشدا بەڵگە و نیشانەی زۆر هەیە بۆ زانایان و شارەزایان.

(٢٣) یەکێکی تر لە نیشانە و بەڵگەکانی خەوتنتانە لە شەو و ڕۆژدا (ئەڵبەتە خەو دیاردەیەکی سەرنج ڕاکێشەو جێگەی ورد بوونەوە و تێرامانە)، لەکاتی بێداریشدا هەوڵ و کۆششتانە بۆ بەهرە وەرگرتن لە بەخششەکانی خوا، جا بەڕاستی ئا لەو دیاردەیەشدا بەڵگەو نیشانەی زۆر هەن بۆ کەسانێک کە دەبیستن و تێدەگەن.

(٢٤) هەروەها لە بەڵگە و نیشانەکانی تری ئەوەیە کە هەورە بروسکەتان نیشان دەدات کە ترسی لێ دەکرێت و ئومێد بەخشیشە (ترس لە دەنگ و ڕوناکی بەهێزی، ترس لەوەی ببێتە مایەی تەرزە و لافاو، هەروەها بەئومێدی فەر و بەرەکەت) و لە ئاسمانەوە باران دەبارێنێت، زەوی پێ زیندوو دەکاتەوە دوای ئەوەی کە مردبوو (ڕوەک و گژوگیاکان وشک بوون) بەڕاستی ئا لەو دیاردەیەشدا بەڵگە و نیشانەی زۆر هەن بۆ کەسانێک ژیریان بخەنە کار.

وَمِنْ ءَايَٰتِهِۦٓ أَن تَقُومَ ٱلسَّمَآءُ وَٱلْأَرْضُ بِأَمْرِهِۦ ۚ ثُمَّ إِذَا دَعَاكُمْ دَعْوَةً مِّنَ ٱلْأَرْضِ إِذَآ أَنتُمْ تَخْرُجُونَ ﴿٢٥﴾ وَلَهُۥ مَن فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۖ كُلٌّ لَّهُۥ قَٰنِتُونَ ﴿٢٦﴾ وَهُوَ ٱلَّذِى يَبْدَؤُا۟ ٱلْخَلْقَ ثُمَّ يُعِيدُهُۥ وَهُوَ أَهْوَنُ عَلَيْهِ ۚ وَلَهُ ٱلْمَثَلُ ٱلْأَعْلَىٰ فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۚ وَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ ﴿٢٧﴾ ضَرَبَ لَكُم مَّثَلًا مِّنْ أَنفُسِكُمْ ۖ هَل لَّكُم مِّن مَّا مَلَكَتْ أَيْمَٰنُكُم مِّن شُرَكَآءَ فِى مَا رَزَقْنَٰكُمْ فَأَنتُمْ فِيهِ سَوَآءٌ تَخَافُونَهُمْ كَخِيفَتِكُمْ أَنفُسَكُمْ ۚ كَذَٰلِكَ نُفَصِّلُ ٱلْءَايَٰتِ لِقَوْمٍ يَعْقِلُونَ ﴿٢٨﴾ بَلِ ٱتَّبَعَ ٱلَّذِينَ ظَلَمُوٓا۟ أَهْوَآءَهُم بِغَيْرِ عِلْمٍ ۖ فَمَن يَهْدِى مَنْ أَضَلَّ ٱللَّهُ ۖ وَمَا لَهُم مِّن نَّٰصِرِينَ ﴿٢٩﴾ فَأَقِمْ وَجْهَكَ لِلدِّينِ حَنِيفًا ۚ فِطْرَتَ ٱللَّهِ ٱلَّتِى فَطَرَ ٱلنَّاسَ عَلَيْهَا ۚ لَا تَبْدِيلَ لِخَلْقِ ٱللَّهِ ۚ ذَٰلِكَ ٱلدِّينُ ٱلْقَيِّمُ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٣٠﴾ ۞ مُنِيبِينَ إِلَيْهِ وَٱتَّقُوهُ وَأَقِيمُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ وَلَا تَكُونُوا۟ مِنَ ٱلْمُشْرِكِينَ ﴿٣١﴾ مِنَ ٱلَّذِينَ فَرَّقُوا۟ دِينَهُمْ وَكَانُوا۟ شِيَعًا ۖ كُلُّ حِزْبٍۭ بِمَا لَدَيْهِمْ فَرِحُونَ ﴿٣٢﴾



(٢٥) لە نیشانە و بەڵگەکانی تری خوا ئەوەیە کە ئاسمان و زەوی راوەستاون بە فەرمانی ئەو (خۆرو هەسارە و ئەستێرەکانی لە بۆشایدا راگرتووە بێ کۆڵەکە و بێ پاڵپشتێکی دیار)، لەوەودوا کاتێک بانگێکی لێکردن، کە ئێوە لە توێی خاکدان، دەستبەجێ هەمووتان دەردەچن لە زەویدا و زیندوو دەبنەوە.

(٢٦) هەرچی لە ئاسمانەکان و زەویدا هەیە هەمووی ئەو بەدیهێنەریانە و خاوەنیانە، هەر هەمووشیان ملکەچ و فەرمانبەرداری ئەون.

(٢٧) هەر ئەو زاتە لە سەرەتاوە بەدیهێنراوەکان بەدی دەهێنێت، پاشان بە جۆرێکی تر دروستیان دەکاتەوە، ئەو کارەش بۆ خوا ئاسانە، نموونەی بەرز و وەسفی بڵند هەر شایستەی ئەو زاتەیە لە ئاسمانەکان و زەویدا، هەر ئەویش زاتێکی باڵادەست و دانایە.

(٢٨) هەر لە خۆتان نموونەی بۆ هێناونەتەوە (کە چەندە بڕیاردانی هاوەڵ و شەریک بۆ خوا نادروست و نابەجێیە) ئایا ئێوە رازین بەندە و بەردەستەکانتان ببنە هاوبەشتان و لەو ماڵ و سامانەی پێمانداون شەریک بن و وەک یەک سوودی لێوەربگرن و دەستی تێبخەن و لێیان بترسن و حسابیان بۆ بکەن، هەروەک چۆن ئێوە لە یەکتر سڵدەکەنەوە و حساب بۆ یەکتر دەکەن؟! ئا بەو شێوەیە بەڵگە و نموونەی زۆر روون دەکەینەوە بۆ کەسانێک کە ژیرو هۆشمەند بن...

(٢٩) نەخێر، ئەوانە ژیر نابن، بەڵکو ئەوانەی ستەمیان کردووە شوێنی ئارەزووی خۆیان دەکەون دوور لە هەموو بنەمایەکی زانستی و زانیاری، جا ئیترکێ دەتوانێت رێنموویی ئەو کەسانە بکات خوا گومڕای کردوون (ئەڵبەتە خۆیان رێگەی گومڕاییان هەڵبژاردووە، خوای گەورەش بە زۆر هیدایەتی کەس نادات)، کەسیش پشتیوان و یارمەتیدەریان لە سزای سەخت بیانپارێزێت.

(٣٠) (ئەی ئینسان بەدڵێکی پاک و بێگەردەوە) روو بکەرە بەرنامە و ئاینی خوا و ئەملاولا مەکە، خەڵکینە ئێوەش پابەندی ئەو نەخشەیە بن کە خوا ئێوەی لەسەر دروست کردووە (واتە قورئان کەتەلۆک و نەخشەی ژیانی ئادەمیزادەکانە لێی لامەدەن)، هیچ جۆرە گۆڕانکاریەک لە هیچ نەخشە و دروستکراوێکی خوادا نی‌یە، ئائەوەیە دینی راست و دروست، بەڵام زۆربەی خەڵکی ئەم راستیانە نازانن.

(٣١) خەڵکینە: روو بکەنە پەروەردگارتان، بەملکەچی بگەڕێنەوە بۆلای، لەو بترسن و خۆتان لە سزای بپارێزن، نوێژەکانیشتان بەچاکی ئەنجام بدەن، مەبن بەو کەسانەی کە شەریک و هاوەڵی بۆ بڕیار دەدەن...

(٣٢) لەوانەی کە ئاینەکەیان بەش بەش کردووە و بوونەتە چەندەها گرۆو دەستە (بڕوایان بەهەندێکی هەیەو بڕوایان بەهەندێکی نی‌یە و کوێرانە شوێن رابەرەکەیان دەکەون) هەرگرۆ و پارتێکیش دڵخۆشن بە بەرنامە و نەخشە و پلانی خۆیان (وا دەزانن چاکترین رێبازیان گرتۆتەبەر).

وَإِذَا مَسَّ ٱلنَّاسَ ضُرٌّ دَعَوْا۟ رَبَّهُم مُّنِيبِينَ إِلَيْهِ ثُمَّ إِذَآ أَذَاقَهُم
مِّنْهُ رَحْمَةً إِذَا فَرِيقٌ مِّنْهُم بِرَبِّهِمْ يُشْرِكُونَ ﴿٣٣﴾ لِيَكْفُرُوا۟ بِمَآ
ءَاتَيْنَٰهُمْ فَتَمَتَّعُوا۟ فَسَوْفَ تَعْلَمُونَ ﴿٣٤﴾ أَمْ أَنزَلْنَا عَلَيْهِمْ
سُلْطَٰنًا فَهُوَ يَتَكَلَّمُ بِمَا كَانُوا۟ بِهِۦ يُشْرِكُونَ ﴿٣٥﴾ وَإِذَآ أَذَقْنَا
ٱلنَّاسَ رَحْمَةً فَرِحُوا۟ بِهَا وَإِن تُصِبْهُمْ سَيِّئَةٌۢ بِمَا قَدَّمَتْ أَيْدِيهِمْ
إِذَا هُمْ يَقْنَطُونَ ﴿٣٦﴾ أَوَلَمْ يَرَوْا۟ أَنَّ ٱللَّهَ يَبْسُطُ ٱلرِّزْقَ لِمَن يَشَآءُ
وَيَقْدِرُ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَٰتٍ لِّقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ ﴿٣٧﴾ فَـَٔاتِ ذَا ٱلْقُرْبَىٰ
حَقَّهُۥ وَٱلْمِسْكِينَ وَٱبْنَ ٱلسَّبِيلِ ذَٰلِكَ خَيْرٌ لِّلَّذِينَ يُرِيدُونَ
وَجْهَ ٱللَّهِ وَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُفْلِحُونَ ﴿٣٨﴾ وَمَآ ءَاتَيْتُم مِّن رِّبًا
لِّيَرْبُوَا۟ فِىٓ أَمْوَٰلِ ٱلنَّاسِ فَلَا يَرْبُوا۟ عِندَ ٱللَّهِ وَمَآ ءَاتَيْتُم مِّن زَكَوٰةٍ
تُرِيدُونَ وَجْهَ ٱللَّهِ فَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُضْعِفُونَ ﴿٣٩﴾ ٱللَّهُ ٱلَّذِى
خَلَقَكُمْ ثُمَّ رَزَقَكُمْ ثُمَّ يُمِيتُكُمْ ثُمَّ يُحْيِيكُمْ هَلْ مِن
شُرَكَآئِكُم مَّن يَفْعَلُ مِن ذَٰلِكُم مِّن شَىْءٍ سُبْحَٰنَهُۥ وَتَعَٰلَىٰ
عَمَّا يُشْرِكُونَ ﴿٤٠﴾ ظَهَرَ ٱلْفَسَادُ فِى ٱلْبَرِّ وَٱلْبَحْرِ بِمَا كَسَبَتْ
أَيْدِى ٱلنَّاسِ لِيُذِيقَهُم بَعْضَ ٱلَّذِى عَمِلُوا۟ لَعَلَّهُمْ يَرْجِعُونَ ﴿٤١﴾

(٣٣) کاتێک تەنگانەو ناخۆشی تووشی خەڵکی دەبێت، هاناو هاوار بۆ پەروەردگاریان دەبەن و هەر لەو دەپاڕێنەوە، پاشان کە ناخۆشی و تەنگانەکە نەماو خوا دەروی رەحمەت و میهرەبانی خۆی لێکردنەوە، یەکسەر دەستەیەکیان هاوەڵ بۆ پەروەردگاریان بڕیار دەدەن.

(٣٤) با ئەوانە هەر بەدنمەک بن و قەدری نازو نیعمەت و بەخششەکانمان نەزانن، با رابوێرن، لە ئایندەدا دەزانن چ پەنێکیان داوە و چ بەڵایەکیان بەسەر خۆیان هێناوە.

(٣٥) ئایا مەگەر بۆسەر ئەوهاوەڵگەرانە بەڵگەمان ناردووە تا وێڵ بن لە خواپەرستی و شوێنی نادروستی بکەون؟! بەڵگەکەش قسە بکات و شەریک بۆ خوا دانانەکەیان پەسەند بکات؟!

(٣٦) کاتێکیش رەحمەتێک بەخەڵکی بچێژین، ئەوا لە خۆیان بایی دەبن (زۆربەیان دینداری فەرامۆش دەکەن)، خۆ ئەگەر بەڵاو ناخۆشیەکیشیان تووش بێت لە سەرئەنجامی کارو کردەوەو دەست پێشخەری خۆیاندا، دەست بەجێ نائومێد دەبن لە رەحمەتی خوا.

(٣٧) ئایا ئەوانە سەرنجیان نەداوە کە بەراستی خوا رزق و رۆزی و سامان فراوان دەکات بۆ هەر کەس کە بیەوێت، یاخود دەیگرێتەوە و کەمی دەکاتەوە، بێگومان ئا لەو حاڵەتانەشدا بەڵگەی زۆر هەیە بۆ ئەو کەسانەی کە باوەڕ دەهێنن.

(٣٨) کەواتە ئەی ئیماندار: مافی خزمان بدە، لە هەر روویەکەوە مافیان دەکەوێتە سەرت جێبەجێی بکە، هەروەها مافی هەژاران و رێبوارانیش فەرامۆش مەکە، ئەو رەفتارانە چاکتر و پەسەندترە بۆ ئەو کەسانەی کە مەبەستیان رەزامەندی خوایە، بێگومان هەر ئەوانەش سەرفرازو سەرکەوتوون.

(٣٩) هەر پارەو سامانێکتان بە سوو دابێت بەخەڵکی بۆئەوەی زیاد بکات لەناو سامانەکەیاندا، ئەوە بەرەکەت ناکات و پاداشتی نابێت لای خوا (بەڵکو موحاسەبەشی لە دوایە)، ئەوەش بە زەکات داوتانە و مەبەستتان رەزامەندی خوایە، ئا ئەو جۆرە کەسانە پاداشتیان چەند بەرابەر کردۆتەوە.

(٤٠) خوا ئەو زاتەیە کە دروستی کردوون و پاشان رزق و رۆزی پێبەخشیون (ئاو و هەوا و خۆر و خاک و هۆکارەکانی بەدەست هێنانی سامان بەشێکن لە بەخششەکانی) لەدوایدا دەتانمرێنێت، پاشان زیندووتان دەکاتەوە، ئایا هیچ کام لەوانەی کە کردوتانن بە هاوبەشی خوا، شتی وایان لە دەست دێت؟!، پاکی و بڵندی بۆ ئەو زاتەیە لەوەی ئەوانە دەیکەن بە هاوبەشی.

(٤١) تاوان و خراپە دەرکەوتووە و هەموو سەر زەوی و دەریاکانیشی گرتۆتەوە، بەهۆی ئەو تاوان و گوناهانەوە کە خەڵکی دەستیان داوەتێ، سەرئەنجام دەبێت تاڵاوی هەندێک لە کردەوەکانیان بچێژن (کە بەرپابوونی جەنگ و کارەساتە سروشتیەکانە) بۆ ئەوەی بگەڕێنەوە بۆ رێبازی پاکی وخواناسی.

قُلْ سِيرُوا فِي الْأَرْضِ فَانظُرُوا كَيْفَ كَانَ عَاقِبَةُ الَّذِينَ مِن قَبْلُ ۚ كَانَ أَكْثَرُهُم مُّشْرِكِينَ ﴿٤٢﴾ فَأَقِمْ وَجْهَكَ لِلدِّينِ الْقَيِّمِ مِن قَبْلِ أَن يَأْتِيَ يَوْمٌ لَّا مَرَدَّ لَهُ مِنَ اللَّهِ ۖ يَوْمَئِذٍ يَصَّدَّعُونَ ﴿٤٣﴾ مَن كَفَرَ فَعَلَيْهِ كُفْرُهُ ۖ وَمَنْ عَمِلَ صَالِحًا فَلِأَنفُسِهِمْ يَمْهَدُونَ ﴿٤٤﴾ لِيَجْزِيَ الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ مِن فَضْلِهِ ۚ إِنَّهُ لَا يُحِبُّ الْكَافِرِينَ ﴿٤٥﴾ وَمِنْ آيَاتِهِ أَن يُرْسِلَ الرِّيَاحَ مُبَشِّرَاتٍ وَلِيُذِيقَكُم مِّن رَّحْمَتِهِ وَلِتَجْرِيَ الْفُلْكُ بِأَمْرِهِ وَلِتَبْتَغُوا مِن فَضْلِهِ وَلَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ ﴿٤٦﴾ وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا مِن قَبْلِكَ رُسُلًا إِلَىٰ قَوْمِهِمْ فَجَاءُوهُم بِالْبَيِّنَاتِ فَانتَقَمْنَا مِنَ الَّذِينَ أَجْرَمُوا ۖ وَكَانَ حَقًّا عَلَيْنَا نَصْرُ الْمُؤْمِنِينَ ﴿٤٧﴾ اللَّهُ الَّذِي يُرْسِلُ الرِّيَاحَ فَتُثِيرُ سَحَابًا فَيَبْسُطُهُ فِي السَّمَاءِ كَيْفَ يَشَاءُ وَيَجْعَلُهُ كِسَفًا فَتَرَى الْوَدْقَ يَخْرُجُ مِنْ خِلَالِهِ ۖ فَإِذَا أَصَابَ بِهِ مَن يَشَاءُ مِنْ عِبَادِهِ إِذَا هُمْ يَسْتَبْشِرُونَ ﴿٤٨﴾ وَإِن كَانُوا مِن قَبْلِ أَن يُنَزَّلَ عَلَيْهِم مِّن قَبْلِهِ لَمُبْلِسِينَ ﴿٤٩﴾ فَانظُرْ إِلَىٰ آثَارِ رَحْمَتِ اللَّهِ كَيْفَ يُحْيِي الْأَرْضَ بَعْدَ مَوْتِهَا ۚ إِنَّ ذَٰلِكَ لَمُحْيِي الْمَوْتَىٰ ۖ وَهُوَ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ ﴿٥٠﴾

(٤٢) (ئەی پێغەمبەرﷺ) پێیان بڵێ: بگەڕێن بەسەر زەویدا و تەماشا بکەن و سەرنج بدەن و بزانن چۆن بوو سەرئەنجامی پێشینەکان، ئەوانەی زۆربەیان هاوەڵگەرو بت پەرست بوون.

(٤٣) کەواتە رووی خۆت بکەرە ئەم ئاینە پتەو و چاک و دامەزراوە، پێش ئەوەی رۆژێک بێت هیچ کەس نەتوانێت جڵەوی بگرێت و دژایەتی بەرنامەی خوا بکات، ئەو رۆژە خەڵکی هەموو لە یەک جیادەبنەوە (بەهەشتیان بۆ بەهەشت بە رێ دەکرێن، دۆزەخیەکانیش بۆ دۆزەخ).

(٤٤) ئەوەی کافر بێت ئەوە کافر بوونەکەی لەسەری دەکەوێت، ئەوانەش کە کارو کردەوەی چاک ئەنجام دەدەن، ئەوە رێگە بۆ خۆیان خۆش دەکەن (بەرەو بەهەشت).

(٤٥) تا خوا زۆر بە زیادەوە پاداشتی ئەوانە بداتەوە کە ئیمانیان هێناوەو کردەوە چاکەکانیان ئەنجامداوە، بەڕاستی ئەوزاتە کافرانی خۆش ناوێت.

(٤٦) لە بەڵگە و نیشانەکانی (گەورەیی پەروەردگار) ئەوەیە چەندەها جۆر با دەنێرێت وەک مژدە بەخشێک (لەکاتێکدا کە هەڵگری هەور و هەڵمی ئاوە)، تا رەحمەت و میهرەبانی خۆیتان پێ بچێژێت، تا کەشتیەکان بە دەریادا بە فەرمانی ئەو هاتوچۆ بکەن و تا لە بەخششەکانی بەهرەوەر ببن، بۆ ئەوەش سوپاسگوزاری بکەن.

(٤٧) سوێند بەخوا بەڕاستی پێش تۆ (ئەی محمدﷺ) پێغەمبەرانێکمان رەوانە کردووە، بۆ سەر هۆزو گەلەکانیان، بەڵگە و نیشانەی زۆریان بۆ هێنان، بەڵام زۆریان باوەڕیان نەهێنا، بۆیە ئێمەش تۆڵەمان سەند لەوانەی کە تاوانیان کرد، ئەوسا ئیتر سەرخستنی ئیمانداران بە ئەرکی سەرشانی خۆمان زانی و سەرکەوتنمان پێ بەخشین .

(٤٨) خوا ئەو زاتەیە کە چەندەها جۆر ـ با ـ دەنێرێت، ئەو ـ با ـ یە هەور هەڵدەگرێت و لەگەڵ خۆیدا راپێچی دەکات، جا خوا پەخشی دەکاتەوە بە ئاسماندا بەهەر شێوازو شێوەیەک کە بیەوێت، هەورەکان پارچە پارچە دەکات، ئینجا دەبینیت باران لە نێوانیاندا دەردەچێت و دادەبەزێتە سەر زەوی، جا کاتێک بارانەکەی باراند بۆ هەر تاقمێک لە بەندەکانی کە بیەوێت، ئەوانیش یەکسەر خۆشحاڵ و دڵخۆش دەبن و مژدە دەدەن بە یەکتری ...

(٤٩) بەڕاستی پێش ئەوەی دابارێتە سەریان، زۆر نائومێد و بێ هیوا بوون.

(٥٠) جا ئیتر سەرنج بدەو تەماشای چەندەها ئاسەواری رەحمەتی خوا بکە، کە چۆن زەوی زیندوو دەکاتەوە دوای مردنی، بێگومان ئەو زاتەی کە ئەو کارانە ئەنجام دەدات، مردووان زیندوو دەکاتەوەو هەر ئەو زاتە دەسەڵاتی بەسەر هەموو شتێکدا هەیە، (مردووانیش وەک رووەک لەکاتی خۆیدا لە زەوی دەردەهێنێتەوە بۆ لێپرسینەوە).

وَلَئِن أَرْسَلْنَا رِيحًا فَرَأَوْهُ مُصْفَرًّا لَّظَلُّوا۟ مِنۢ بَعْدِهِۦ يَكْفُرُونَ ﴿٥١﴾ فَإِنَّكَ لَا تُسْمِعُ ٱلْمَوْتَىٰ وَلَا تُسْمِعُ ٱلصُّمَّ ٱلدُّعَآءَ إِذَا وَلَّوْا۟ مُدْبِرِينَ ﴿٥٢﴾ وَمَآ أَنتَ بِهَـٰدِ ٱلْعُمْىِ عَن ضَلَـٰلَتِهِمْ ۖ إِن تُسْمِعُ إِلَّا مَن يُؤْمِنُ بِـَٔايَـٰتِنَا فَهُم مُّسْلِمُونَ ﴿٥٣﴾ ۞ ٱللَّهُ ٱلَّذِى خَلَقَكُم مِّن ضَعْفٍ ثُمَّ جَعَلَ مِنۢ بَعْدِ ضَعْفٍ قُوَّةً ثُمَّ جَعَلَ مِنۢ بَعْدِ قُوَّةٍ ضَعْفًا وَشَيْبَةً ۚ يَخْلُقُ مَا يَشَآءُ ۖ وَهُوَ ٱلْعَلِيمُ ٱلْقَدِيرُ ﴿٥٤﴾ وَيَوْمَ تَقُومُ ٱلسَّاعَةُ يُقْسِمُ ٱلْمُجْرِمُونَ مَا لَبِثُوا۟ غَيْرَ سَاعَةٍ ۚ كَذَٰلِكَ كَانُوا۟ يُؤْفَكُونَ ﴿٥٥﴾ وَقَالَ ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْعِلْمَ وَٱلْإِيمَـٰنَ لَقَدْ لَبِثْتُمْ فِى كِتَـٰبِ ٱللَّهِ إِلَىٰ يَوْمِ ٱلْبَعْثِ ۖ فَهَـٰذَا يَوْمُ ٱلْبَعْثِ وَلَـٰكِنَّكُمْ كُنتُمْ لَا تَعْلَمُونَ ﴿٥٦﴾ فَيَوْمَئِذٍ لَّا يَنفَعُ ٱلَّذِينَ ظَلَمُوا۟ مَعْذِرَتُهُمْ وَلَا هُمْ يُسْتَعْتَبُونَ ﴿٥٧﴾ وَلَقَدْ ضَرَبْنَا لِلنَّاسِ فِى هَـٰذَا ٱلْقُرْءَانِ مِن كُلِّ مَثَلٍ ۚ وَلَئِن جِئْتَهُم بِـَٔايَةٍ لَّيَقُولَنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓا۟ إِنْ أَنتُمْ إِلَّا مُبْطِلُونَ ﴿٥٨﴾ كَذَٰلِكَ يَطْبَعُ ٱللَّهُ عَلَىٰ قُلُوبِ ٱلَّذِينَ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٥٩﴾ فَٱصْبِرْ إِنَّ وَعْدَ ٱللَّهِ حَقٌّ ۖ وَلَا يَسْتَخِفَّنَّكَ ٱلَّذِينَ لَا يُوقِنُونَ ﴿٦٠﴾



(٥١) سوێند بە خوا خۆ ئەگەر ڕەشەبایەکی زەرەرمەند بنێرین و ببینن کشتوکاڵ و باخەکانیانی زەرد هەڵگەڕان، ئەوە ئەوانە ئیتر دەست دەکەن بە ناشوکری و لە دین وەردەگەڕێن.

(٥٢) جا بەڕاستی تۆ ئەی پێغەمبەر ﷺ ناتوانیت دەنگی خۆت، واتە: بانگەوازەکەت، بە مردووەکان رابگەیەنیت، هەروەها ناتوانیت کەڕ و گوێ گرانەکانی لێ تێبگەیەنیت (کافران وەک مردوو، وەک کەڕن)، کاتێک ڕوو وەردەگێڕن و پشت هەڵدەکەن و بایەخ بە بانگەوازەکەت نادەن.

(٥٣) هەروەها ناتوانیت ڕێنموویی کوێرو نابینایان بکەیت (ئەوانەی دڵیان داخستووە و نایانەوێت تێبینی بکەن) تۆ ناتوانیت لە گومڕایی ڕزگاریان بکەیت، بەڵکو تۆ تەنها دەتوانیت ئایەتەکانی قورئانی ئێمە بدەی بەگوێی ئەو کەسانەدا باوەڕیان پێیەتی و هیچی تر، چونکە ئەوانە هەمیشە ملکەچی فەرمانی خوان.

(٥٤) خوا ئەو زاتەیە ئێوەی بەلاوازی دروست کردووە (سەرەتا نوتفەیەکی لاواز، دوایی وەک دیل لە سکی دایکدا، پاشان هەرمنداڵی لاوازیت تا دەگەیتە تەمەنی لاوی)، ئەوسا خوا هێزو دەسەلاتێکت پێ دەبەخشێت، دوای هێزو توانایی دووبارە ئۆرەی لاوازی و پیری دێت، بێگومان ئەو خوایە هەرچی بوێت دروستی دەکات (ئەم هێزو بێهێزیە بەشێکە لە ویستی ئەو زاتە)، ئەو پەروەردگارە زاناو بە توانایە.

(٥٥) ئەو ڕۆژەی کە قیامەت بەرپا دەبێت تاوانباران سوێند دەخۆن (کە: لە جیهانی بەرزەخدا، یان لە ژیانی دنیادا) تەنها کاتژێرێک ماونەتەوە، ئا ئەوانە کاتی خۆی لە ڕاستی لادەدران.

(٥٦) (لە ڕۆژی قیامەتدا کە تاوانباران سەریان لێشێواوە و سوێندی درۆ دەخۆن) ئەوانەی زانیاری و ئیمانیان پێبەخشرابوو دەڵێن: سوێند بەخوا بێگومان ئێوە بەپێی ئەوەی خوا بڕیاری لەسەر بووە ماونەتەوە (لە دنیادا و لە جیهانی بەرزەخیشدا) تارۆژی زیندووبوونەوە، جا ئەمە ڕۆژی زیندووبوونەوەکەیە، بەڵام ئێوە بەم ڕاستیەتان نەدەزانی و بڕواتان پێی نەبوو.

(٥٧) جا لەو ڕۆژەدا تکاو پاڕانەوە و بڕو بیانووی ئەوانەی ستەمیان کردووە، هیچ سوودێکی نیە بۆیان، بەهیچ شێوەیەک خوا لێیان ڕازی نابێت و ئەوانەش داوای لابردنی ڕق و قینی خوایان لێ ناکرێت، بەهۆی تۆبەوە خۆیان ڕزگار بکەن.

(٥٨) سوێند بەخوا بەڕاستی ئێمە لەم قورئانەدا لە هەموو بابەتێک نموونەمان بۆ خەڵکی هێناوەتەوە، کەچی هەر ئایەتێکیشیان بۆ بهێنیت وبەسەریاندا بخوێنیتەوە، ئەوە بێگومان ئەوانەی کە بێ باوەڕن دەڵێن: ئێوە تەنها پێشێلکەری حەقن و هیچی تر نین !!

(٥٩) ئا بەو شێوەیە خوا مۆر دەنێت بەسەر دڵی ئەوانەدا کە نازانن و بەشوێن حەق و ڕاستیدا ناگەڕێن، (شوێن ڕاستی و حەقیقەت ناکەون).

(٦٠) جا (ئەی محمد ﷺ، ئەی ئیماندار) دان بەخۆدا بگرە و ئارام بگرە، چونکە بێگومان وەعدو بەڵێنی خوا حەق و ڕاستە و هەر دێتەدی، ئەوانەش کە باوەڕیان نیە بێ ئارامت نەکەن و ساردت نەکەنەوە.



بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

الٓمٓ ﴿١﴾ تِلْكَ ءَايَٰتُ ٱلْكِتَٰبِ ٱلْحَكِيمِ ﴿٢﴾ هُدًى وَرَحْمَةً لِّلْمُحْسِنِينَ ﴿٣﴾ ٱلَّذِينَ يُقِيمُونَ ٱلصَّلَوٰةَ وَيُؤْتُونَ ٱلزَّكَوٰةَ وَهُم بِٱلْءَاخِرَةِ هُمْ يُوقِنُونَ ﴿٤﴾ أُو۟لَٰٓئِكَ عَلَىٰ هُدًى مِّن رَّبِّهِمْ ۖ وَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُفْلِحُونَ ﴿٥﴾ وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يَشْتَرِى لَهْوَ ٱلْحَدِيثِ لِيُضِلَّ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ بِغَيْرِ عِلْمٍ وَيَتَّخِذَهَا هُزُوًا ۚ أُو۟لَٰٓئِكَ لَهُمْ عَذَابٌ مُّهِينٌ ﴿٦﴾ وَإِذَا تُتْلَىٰ عَلَيْهِ ءَايَٰتُنَا وَلَّىٰ مُسْتَكْبِرًا كَأَن لَّمْ يَسْمَعْهَا كَأَنَّ فِىٓ أُذُنَيْهِ وَقْرًا ۖ فَبَشِّرْهُ بِعَذَابٍ أَلِيمٍ ﴿٧﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ لَهُمْ جَنَّٰتُ ٱلنَّعِيمِ ﴿٨﴾ خَٰلِدِينَ فِيهَا ۖ وَعْدَ ٱللَّهِ حَقًّا ۚ وَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ ﴿٩﴾ خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ بِغَيْرِ عَمَدٍ تَرَوْنَهَا ۖ وَأَلْقَىٰ فِى ٱلْأَرْضِ رَوَٰسِىَ أَن تَمِيدَ بِكُمْ وَبَثَّ فِيهَا مِن كُلِّ دَآبَّةٍ ۚ وَأَنزَلْنَا مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءً فَأَنۢبَتْنَا فِيهَا مِن كُلِّ زَوْجٍ كَرِيمٍ ﴿١٠﴾ هَٰذَا خَلْقُ ٱللَّهِ فَأَرُونِى مَاذَا خَلَقَ ٱلَّذِينَ مِن دُونِهِۦ ۚ بَلِ ٱلظَّٰلِمُونَ فِى ضَلَٰلٍ مُّبِينٍ ﴿١١﴾

سوورەتی (لقمان)

بەناوی خوای بەخشندە و میهرەبان

(١) سەرنجی سەرەتای سوورەتی (البقرة) بدە.

(٢) ئەوە چەندەها ئایەت و فەرمانێکن لە قورئانی پڕ لە حیکمەت و دانایی .

(٣) ئەم قورئانە هیدایەت بەخش و ڕێنموویی بەخش و رەحمەت و میهرەبانیە بۆ چاکەکاران...

(٤) ئەوانەی کە نوێژەکانیان بەچاکی ئەنجام دەدەن، زەکاتیش (لە ماڵ و سامانیان) دەردەکەن، دڵنیاش دەبن بەهاتنە دیی ڕۆژی قیامەت (خۆیانی بۆ ئامادە دەکەن).

(٥) ئا ئەوانە لەسەر ڕێنموویی و ڕێبازی پەروەردگاریانن، ئا ئەوانەشن رزگار و سەرفراز.

(٦) هەندێک لەخەڵکی هەن قسەی بێ خێر و بێ مانا دەکڕن(وەک گۆرانیە ناپوختەکان، کتێب و شریتە بێ خێرەکان...هتد) تا خۆی و کەسانی تریش لە ڕێبازی خوا وێڵ بکات، بێ ئەوەی هەست بکات بەمەترسی کارەکەی و بزانێت چ کەتنێک دەکات بەخۆی و خەڵکی و بۆیە ئەو شتە بێ نرخوخێرانە دەکڕێت تا گاڵتە بەپەیام و ڕێبازی خوا بکات، ئا ئەوانە سزا و تۆڵەیەکی ریسواکەرو ئابڕووبەر چاوەڕێیانە.

(٧) هەرکاتێکیش ئایەتەکانی ئێمەی بەسەردا دەخوێنرێتەوە، فیز دەکات و فوو دەکاتە خۆی و پشت هەڵدەکات، هەروەک نەیبیستبێت، هەروەک لە گوێیدا قورسی و گرانیی هەبێت، کەوابوو مژدە بدە بەو جۆرە کەسانە بەوەی سزای بەئێش چاوەڕێیانە!!

(٨) بەڕاستی ئەوانەی ئیمانیان هێناوە و کردەوە چاکەکانیان ئەنجامداوە، چەندەها باخچەی بەهەشتی پڕ لە نازو نیعمەت بۆیان ئامادەیە...

(٩) هاوڕێ لەگەڵ ژیانی نەبڕاوە و نەمریی تیایدا، ئەو بەڵێنەی خوا پێی داوون، وەعدە و بەڵێنێکی حەق و ڕاستە و هەر دێتە دی، بەڕاستی ئەو زاتە بە دەسەڵات و دانایە.

(١٠) ئاسمانەکانی دروست کردووە بەبێ کۆڵەکە بەچاوی خۆتان دەیانبینن، لە زەویشدا کێوەکانی دامەزراندوە کە لەنگەری زەویان ڕاگرتووە و (چەندەها سوودی تریان هەیە) نەوەکو ژێرەو ژوورببن و لاربنەوە، جۆرەها زیندەوەر و گیانلەبەریشی تیادا بڵاوکردۆتەوە، (هەروەها دەفەرموێت): لە ئاسمانیشەوە ئاومان دابەزاند، جۆرەها ڕووەک و گژوگیای هاو جووتی بەسوود و بەکەڵک و جوان و ڕازاوەمان لە زەویدا پێ ڕواند.

(١١) ئا ئەمەیە دروستکراوانی خوا، وەرن نیشانم بدەن بزانم ئەوانی ترجگە لەوزاتە، چیان دروست کردووە، نەخێر هیچیان دروست نەکردووە، بەڵکو ستەمکاران هەمیشە لە گومڕاییەکی ئاشکرادان.

وَلَقَدْ ءَاتَيْنَا لُقْمَٰنَ ٱلْحِكْمَةَ أَنِ ٱشْكُرْ لِلَّهِ ۚ وَمَن يَشْكُرْ فَإِنَّمَا يَشْكُرُ لِنَفْسِهِۦ ۖ وَمَن كَفَرَ فَإِنَّ ٱللَّهَ غَنِىٌّ حَمِيدٌ ﴿١٢﴾ وَإِذْ قَالَ لُقْمَٰنُ لِٱبْنِهِۦ وَهُوَ يَعِظُهُۥ يَٰبُنَىَّ لَا تُشْرِكْ بِٱللَّهِ ۖ إِنَّ ٱلشِّرْكَ لَظُلْمٌ عَظِيمٌ ﴿١٣﴾ وَوَصَّيْنَا ٱلْإِنسَٰنَ بِوَٰلِدَيْهِ حَمَلَتْهُ أُمُّهُۥ وَهْنًا عَلَىٰ وَهْنٍ وَفِصَٰلُهُۥ فِى عَامَيْنِ أَنِ ٱشْكُرْ لِى وَلِوَٰلِدَيْكَ إِلَىَّ ٱلْمَصِيرُ ﴿١٤﴾ وَإِن جَٰهَدَاكَ عَلَىٰٓ أَن تُشْرِكَ بِى مَا لَيْسَ لَكَ بِهِۦ عِلْمٌ فَلَا تُطِعْهُمَا ۖ وَصَاحِبْهُمَا فِى ٱلدُّنْيَا مَعْرُوفًا ۖ وَٱتَّبِعْ سَبِيلَ مَنْ أَنَابَ إِلَىَّ ۚ ثُمَّ إِلَىَّ مَرْجِعُكُمْ فَأُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴿١٥﴾ يَٰبُنَىَّ إِنَّهَآ إِن تَكُ مِثْقَالَ حَبَّةٍ مِّنْ خَرْدَلٍ فَتَكُن فِى صَخْرَةٍ أَوْ فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ أَوْ فِى ٱلْأَرْضِ يَأْتِ بِهَا ٱللَّهُ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ لَطِيفٌ خَبِيرٌ ﴿١٦﴾ يَٰبُنَىَّ أَقِمِ ٱلصَّلَوٰةَ وَأْمُرْ بِٱلْمَعْرُوفِ وَٱنْهَ عَنِ ٱلْمُنكَرِ وَٱصْبِرْ عَلَىٰ مَآ أَصَابَكَ ۖ إِنَّ ذَٰلِكَ مِنْ عَزْمِ ٱلْأُمُورِ ﴿١٧﴾ وَلَا تُصَعِّرْ خَدَّكَ لِلنَّاسِ وَلَا تَمْشِ فِى ٱلْأَرْضِ مَرَحًا ۖ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ كُلَّ مُخْتَالٍ فَخُورٍ ﴿١٨﴾ وَٱقْصِدْ فِى مَشْيِكَ وَٱغْضُضْ مِن صَوْتِكَ ۚ إِنَّ أَنكَرَ ٱلْأَصْوَٰتِ لَصَوْتُ ٱلْحَمِيرِ ﴿١٩﴾

(١٢) سوێند بە خوا بەڕاستی ئێمە حیکمەت و دانایمان بە ـ لوقمان ـ بەخشی، بەم شێوەیە (پێمان وت) شوکرانە بژێرو سوپاسگوزاری خوا بکە، خۆ ئەوەی سوپاسگوزار بێت ئەوە قازانج و سوودی سوپاسگوزاریەکەی هەر بۆخۆی دەگەڕێتەوە، ئەوەش سوپاسی خوای نەکرد، ئەوە بێگومان خوا بێ نیازەو سوپاسکراوە (پێویستی بەسوپاسی کەس نیە).

(١٣) جا لوقمان بەکوڕەکەی خۆی وت لەکاتێکدا کە ئامۆژگاری دەکرد: کوڕە شیرینەکەم! نەکەیت شتێک یان کەسێک بە هاوتاو هاوبەشی خوا بڕیار بدەیت، چونکە بەڕاستی هاوتاو هاوبەش بڕیاردان ستەمێکی زۆر گەورە و ناڕەوایە.

(١٤) (لێرەدا خوا ئامۆژگاریەکان لە دەمی لوقمان وەردەگرێت و خۆی ئامۆژگاریمان دەکات و دەفەرموێت): ئێمە فەرمانماندداوە بە ئادەمیزاد بە چاک رەفتاری لەگەڵ دایک و باوکیدا، دایکی بە ئێش و ئازارو لاوازی و بێتاقەتیەکی زۆرەوە، (بە پێستی سکی نۆ مانگ) هەڵی گرتووە، بڕینەوەشی لە دوای دوو ساڵە، فەرمانمان پێدا کە ئەی ئینسان سوپاسگوزاری منیش و دایک و باوکیشت بە، دڵنیابن کە گەڕانەوەتان هەر بۆ لای منە.

(١٥) ئەگەر دایک و باوکت کۆششیان لەگەڵتا کرد، تا بەبێ هیچ بەڵگە و زانیاریەک هاوەڵ بۆ من بڕیار بدەیت، ئەوە فەرمانبەرداریان مەبە و بە قسەیان مەکە، لە دنیاشدا هاوڕێ و هاوەڵ و خزمەتگوزارێکی چاک بە بۆیان لە هەموو بارو دۆخێکدا، شوێنی ڕێبازی ئەوانە بکەوە کە بۆلای من گەڕاونەتەوە، لەوەودوا گەڕانەوەتان هەر بۆ لای منە، جا هەواڵتان دەدەمێ بەو کارو کردەوانەی کە دەتانکرد.

(١٦) پاشان لەسەر زاری لوقمان دەفەرموێت: ئەی کوڕی ئازیزم! بەڕاستی ئەگەر گوناهێک بە قەدەر تۆوی خەرتەلەیەک (کە زۆر وردە) هەبێت و لەناو بەردێکدا لە ئاسمانەکان یان لە زەویدا حەشاردرا بێت، (لای خوا شاراوە نیە)و دەیهێنێتە مەیدان، چونکە بەڕاستی خوا هیچ شتێکی لێ شاراوە نیە و زۆریش ئاگایە.

(١٧) کوڕی شیرینم نوێژەکانت بەچاکی ئەنجام بدە، فەرمان بەچاکە بدە، قەدەغە لەگوناهو خراپە بکە، بە ئارامبە لە بەرامبەر ئەو ناخۆشیانەی کە تووشت دەبێت، بەڕاستی ئەوانەی کە باسکران هەندێکن لەوانەی هەر دەبێت بکرێن.

(١٨) هەروەها رووت وەرمەگێڕە لە خەڵکی و (لووت بەرز مەبە و بەچاوی سووک سەیریان مەکە)، بەسەر زەویدا بەناز و فیزەوە مەڕۆ، بەڕاستی خوا ئەو کەسانەی خۆش ناوێت کە خۆهەڵکێش و فەخر فرۆش و فیزاوین.

(١٩) هەوڵ بدە لە ڕۆیشتنتدا مام ناوەندیانە بڕۆ، بەرەو ئامانجێکی چاک هەنگاو بنێ، بەدەنگی هێواش و لەبار گفتوگۆ بکە و بدوێ، چونکە بەڕاستی بێزارترین و ناخۆشترینی دەنگەکان دەنگی گوێ درێژەکانە.

أَلَمْ تَرَوْا أَنَّ اللَّهَ سَخَّرَ لَكُم مَّا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الْأَرْضِ وَأَسْبَغَ عَلَيْكُمْ نِعَمَهُ ظَاهِرَةً وَبَاطِنَةً وَمِنَ النَّاسِ مَن يُجَادِلُ فِي اللَّهِ بِغَيْرِ عِلْمٍ وَلَا هُدًى وَلَا كِتَابٍ مُّنِيرٍ ﴿٢٠﴾ وَإِذَا قِيلَ لَهُمُ اتَّبِعُوا مَا أَنزَلَ اللَّهُ قَالُوا بَلْ نَتَّبِعُ مَا وَجَدْنَا عَلَيْهِ آبَاءَنَا أَوَلَوْ كَانَ الشَّيْطَانُ يَدْعُوهُمْ إِلَىٰ عَذَابِ السَّعِيرِ ﴿٢١﴾ ۞ وَمَن يُسْلِمْ وَجْهَهُ إِلَى اللَّهِ وَهُوَ مُحْسِنٌ فَقَدِ اسْتَمْسَكَ بِالْعُرْوَةِ الْوُثْقَىٰ وَإِلَى اللَّهِ عَاقِبَةُ الْأُمُورِ ﴿٢٢﴾ وَمَن كَفَرَ فَلَا يَحْزُنكَ كُفْرُهُ إِلَيْنَا مَرْجِعُهُمْ فَنُنَبِّئُهُم بِمَا عَمِلُوا إِنَّ اللَّهَ عَلِيمٌ بِذَاتِ الصُّدُورِ ﴿٢٣﴾ نُمَتِّعُهُمْ قَلِيلًا ثُمَّ نَضْطَرُّهُمْ إِلَىٰ عَذَابٍ غَلِيظٍ ﴿٢٤﴾ وَلَئِن سَأَلْتَهُم مَّنْ خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ لَيَقُولُنَّ اللَّهُ قُلِ الْحَمْدُ لِلَّهِ بَلْ أَكْثَرُهُمْ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٢٥﴾ لِلَّهِ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ إِنَّ اللَّهَ هُوَ الْغَنِيُّ الْحَمِيدُ ﴿٢٦﴾ وَلَوْ أَنَّمَا فِي الْأَرْضِ مِن شَجَرَةٍ أَقْلَامٌ وَالْبَحْرُ يَمُدُّهُ مِن بَعْدِهِ سَبْعَةُ أَبْحُرٍ مَّا نَفِدَتْ كَلِمَاتُ اللَّهِ إِنَّ اللَّهَ عَزِيزٌ حَكِيمٌ ﴿٢٧﴾ مَّا خَلْقُكُمْ وَلَا بَعْثُكُمْ إِلَّا كَنَفْسٍ وَاحِدَةٍ إِنَّ اللَّهَ سَمِيعٌ بَصِيرٌ ﴿٢٨﴾




(٢٠) ئایا سەرنجتان نەداوە کە بەڕاستی هەرچی لە ئاسمانەکان و زەویدا هەیە هەمووی خوا بۆ خزمەتی ئێوەی دروست کردووە و ملکەچی کردووە، هەروەها بەفراوانی نازو نیعمەتی ئاشکراو پەنهانی بەسەردا رژاندون، (لەگەڵ ئەوەشدا) هەندێک لە خەڵکی موجادەلە و گفتوگۆی نابەجێ دەربارەی خوا و بەرنامەکەی دەکەن، بێ هیچ بەڵگەیەکی زانستی و رێنموویەکی پێغەمبەران و کتێبێکی روونکەرەوەی خوایی.
(٢١) کاتێکیش پێیان بوترێت شوێنی ئەو بەرنامەیە بکەون کە خوا ناردویەتی، ئەوە دەڵێن: نەخێر شوێنی ئەوە ناکەوین، بەڵکو هەر شوێنی ئەو شتانە دەکەوین کە باو و باپیران و مامۆستایانمان پەیڕەوییان لی کردووە، ئایا ئەگەر شەیتانیش بانگی کردبن بۆ سزای داگیرساوی دۆزەخ، هەر پەیڕەوی دەکەن؟!.
(٢٢) ئەو کەسەی روو بکاتە پەروەردگاری و کارەکانی هەمووی بگێڕێتەوە بۆ لای ئەو، لە کاتێکدا ئادەمیزادێکی چاکەخوازە، ئەوە بەڕاستی مانای وایە کە دەستی بە بەهێزترین هۆکارەوە گرتووە، سەرئەنجامی هەموو کارێکیش هەر بۆ لای خوا دەگەڕێتەوە.
(٢٣) ئەوەش کافر بووە، ئەوە کافربوونەکەی، خەفەتبارت نەکات، گەڕانەوەیان هەر بۆ لای ئێمەیە، جا ئاگاداریان دەکەینەوە بەوەی کە کردوویانە، بێگومان خوا ئاگادارە بە هەموو ئەو شتانەی کە لە سینەو دڵ و دەروونەکاندا حەشاردراون.
(٢٤) کەمێک ماوەیان دەدەین، تا تاوێک رابوێرن، پاشان ناچاریان دەکەین کە بچنە ناو سزای توندو سەختەوە.
(٢٥) سوێند بە خوا ئەگەر پرسیار لە خوانەناسان بکەیت: کێ ئاسمانەکان و زەوی دروست کردووە، ئەوە بە دڵنیاییەوە دەڵێن: الله، دروستی کردوون، تۆش ئەی محمد ﷺ بڵێ: سوپاس و ستایش بۆ خوا (لەسەر وتنی راستی)، نەخێر وانی‌یە، ئەو وەلامە لە قەناعەتەوە هەڵنەقولاوە، بەڵکو زۆربەیان نازانن (لە خۆیانەوە قسە دەکەن).
(٢٦) هەرچی لە ئاسمانەکان و زەویدا هەیە، هەر خوا خاوەنیانە، بەڕاستی هەر ئەو خوایە خۆی بێنیازە و سوپاسگوزاریی هەر شایستەی ئەوە (ئەگەر خەڵکی بەوەفا و بە ئەمەک بن).
(٢٧) خۆ ئەگەر بەڕاستی هەرچی درەخت هەیە لە زەویدا ببنە پێنووس، دەریاش چەندەیە ببێتە حەوت ئەوەندە و (ببێتە مرەکەب و زانستی و نهێنی دروستکراوەکانی خوا بنووسنەوە)، ئەوە هێشتا زانست و زانیاری و فەرمانەکانی خوا هەر تەواو نابێت، بەڕاستی خوای گەورە بەدەسەڵاتە و دانایە.
(٢٨) دروستکردن و بەدیهێنانی هەمووتان و زیندوکردنەوەتان، تەنها وەک دروستکردن و زیندووکردنەوەی تاکەکەسێک وایە، بەڕاستی خوا بیسەرە و بینایە.

أَلَمْ تَرَ أَنَّ ٱللَّهَ يُولِجُ ٱلَّيْلَ فِي ٱلنَّهَارِ وَيُولِجُ ٱلنَّهَارَ فِي ٱلَّيْلِ وَسَخَّرَ ٱلشَّمْسَ وَٱلْقَمَرَ كُلٌّ يَجْرِىٓ إِلَىٰٓ أَجَلٍ مُّسَمًّى وَأَنَّ ٱللَّهَ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرٌ ﴿٢٩﴾ ذَٰلِكَ بِأَنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلْحَقُّ وَأَنَّ مَا يَدْعُونَ مِن دُونِهِ ٱلْبَٰطِلُ وَأَنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلْعَلِىُّ ٱلْكَبِيرُ ﴿٣٠﴾ أَلَمْ تَرَ أَنَّ ٱلْفُلْكَ تَجْرِى فِى ٱلْبَحْرِ بِنِعْمَتِ ٱللَّهِ لِيُرِيَكُم مِّنْ ءَايَٰتِهِۦٓ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَٰتٍ لِّكُلِّ صَبَّارٍ شَكُورٍ ﴿٣١﴾ وَإِذَا غَشِيَهُم مَّوْجٌ كَٱلظُّلَلِ دَعَوُا۟ ٱللَّهَ مُخْلِصِينَ لَهُ ٱلدِّينَ فَلَمَّا نَجَّىٰهُمْ إِلَى ٱلْبَرِّ فَمِنْهُم مُّقْتَصِدٌ وَمَا يَجْحَدُ بِـَٔايَٰتِنَآ إِلَّا كُلُّ خَتَّارٍ كَفُورٍ ﴿٣٢﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُوا۟ رَبَّكُمْ وَٱخْشَوْا۟ يَوْمًا لَّا يَجْزِى وَالِدٌ عَن وَلَدِهِۦ وَلَا مَوْلُودٌ هُوَ جَازٍ عَن وَالِدِهِۦ شَيْـًٔا إِنَّ وَعْدَ ٱللَّهِ حَقٌّ فَلَا تَغُرَّنَّكُمُ ٱلْحَيَوٰةُ ٱلدُّنْيَا وَلَا يَغُرَّنَّكُم بِٱللَّهِ ٱلْغَرُورُ ﴿٣٣﴾ إِنَّ ٱللَّهَ عِندَهُۥ عِلْمُ ٱلسَّاعَةِ وَيُنَزِّلُ ٱلْغَيْثَ وَيَعْلَمُ مَا فِى ٱلْأَرْحَامِ وَمَا تَدْرِى نَفْسٌ مَّاذَا تَكْسِبُ غَدًا وَمَا تَدْرِى نَفْسٌۢ بِأَىِّ أَرْضٍ تَمُوتُ إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٌۢ ﴿٣٤﴾

سُورَةُ السَّجْدَةِ

(٢٩) ئایا سەرنجت نەداوە کە بەڕاستی خوا شەو تێهەڵکێشی ڕۆژ دەکات و ڕۆژیش تێهەڵکێشی شەو دەکات، خۆر و مانگی بۆ تەرخان و ملکەچ کردون، هەریەکەیان تاکاتێکی دیاریکراو لە سوڕانەوەیاندا بەردەوام دەبن، بەڕاستی خوا بەکارو کردەوەتان زۆر ئاگادارە.

(٣٠) ئەو شتانە دڵڕیدەخەن کە: بێگومان هەر خوا خۆی حق و ڕاستەقینەیە، بەڕاستی هەرچی خەڵکی لەباتی ئەو دەیپەرستن و هاواری لێدەکەن، بەتاڵ و ناحەقیە، دڵنیابن خوا هەر خۆی هەمیشە بەرزو پایە بڵندو گەورەیە.

(٣١) ئایا سەرنجت نەداوە کە بەڕاستی کەشتیەکان بە دەریادا هاتوچۆ دەکەن و نازو نیعمەتی خوا دەهێنن و دەیبەن و دەسەڵاتی خوا دەخەنە ڕوو، بەڕاستی ئا لەو شتانەدا بەڵگە و نیشانەی زۆر هەیە بۆ ئەو کەسانەی زۆر دان بەخۆدا دەگرن و زۆر سوپاسگوزارن.

(٣٢) کاتێکیش لە دەریادا شەپۆلێک ئابڵوقەی هاوەڵگەروکافرەکان بدات، وەک کێوەکان گەورە بێت، ئەوە هاناو هاوار هەر بۆ خوا دەبەن زۆر بە دڵسۆزانە ملکەچن بۆ خوا، جا کاتێک فریایان دەکەوێت و ڕزگاریان دەکات و دەیانگەیەنێتە وشکانی، جا هەیانە بەردەوام دەبێت لە سەر ڕێبازی ئیمان و دەمێنێتەوە لەسەر یەکتاناسینی خوای میهرەبان، (هەشیانە ڕێگەی نادروستی خۆی دەگرێتەوە)، جا کەس لە ئایات و بەڵگەکانی ئێمە نکول و پەیمان شکێنی ناکات جگە لە زۆردار و ناپاک و سپڵە .

(٣٣) ئەی خەڵکینە لە پەروەردگارتان بترسن (خۆتان لە خەشم و قینی بپارێزن) و لە ڕۆژێک بترسن کە باوک فریای ڕۆڵەی خۆی ناکەوێت، ڕۆڵەیش هیچی لە دەست نایەت کە بۆ باوکی ئەنجامی بدات، بەڕاستی بەڵێنی خوا بە بەرپابوونی قیامەت، حەقیقەت و ڕاستەقینەیە، کەوابوو وریا بن ژیانی دنیا لە خشتەتان نەبات، (نەفسی بەدکار و شەیتانی بەدرەفتار) سەرگەردانتان نەکات و غەڕاتان نەکات لە ڕێبازی خوا.

(٣٤) بەڕاستی هەر خوا خۆی زانیاری بەرپابوونی ڕۆژی قیامەت دەزانێت، بارانیش هەر ئەو دەیبارێنێت، دەزانێت چی لە سکی دایکاندا هەیە، هیچ کەس نازانێت سبەی چی بەسەردێت و چی دەست دەکەوێت (لەبەرهەمی مادی دنیایی یان لە زەخیرە و توێشووی قیامەت)، هیچ کەسیش نازانێت لەسەر چ زەویەک دەمرێت و کۆتایی بەژیانی دێت (هەروەها کاتی‌مردن و چۆنیەتیەکەیشی شاراوەیە) بەڕاستی خوا بە هەموو شتێک زانایە و ئاگادارە.

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

الٓمٓ ﴿١﴾ تَنزِيلُ ٱلْكِتَٰبِ لَا رَيْبَ فِيهِ مِن رَّبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٢﴾ أَمْ يَقُولُونَ ٱفْتَرَىٰهُ ۚ بَلْ هُوَ ٱلْحَقُّ مِن رَّبِّكَ لِتُنذِرَ قَوْمًا مَّآ أَتَىٰهُم مِّن نَّذِيرٍ مِّن قَبْلِكَ لَعَلَّهُمْ يَهْتَدُونَ ﴿٣﴾ ٱللَّهُ ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَا فِى سِتَّةِ أَيَّامٍ ثُمَّ ٱسْتَوَىٰ عَلَى ٱلْعَرْشِ ۖ مَا لَكُم مِّن دُونِهِۦ مِن وَلِىٍّ وَلَا شَفِيعٍ ۚ أَفَلَا تَتَذَكَّرُونَ ﴿٤﴾ يُدَبِّرُ ٱلْأَمْرَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ إِلَى ٱلْأَرْضِ ثُمَّ يَعْرُجُ إِلَيْهِ فِى يَوْمٍ كَانَ مِقْدَارُهُۥٓ أَلْفَ سَنَةٍ مِّمَّا تَعُدُّونَ ﴿٥﴾ ذَٰلِكَ عَٰلِمُ ٱلْغَيْبِ وَٱلشَّهَٰدَةِ ٱلْعَزِيزُ ٱلرَّحِيمُ ﴿٦﴾ ٱلَّذِىٓ أَحْسَنَ كُلَّ شَىْءٍ خَلَقَهُۥ ۖ وَبَدَأَ خَلْقَ ٱلْإِنسَٰنِ مِن طِينٍ ﴿٧﴾ ثُمَّ جَعَلَ نَسْلَهُۥ مِن سُلَٰلَةٍ مِّن مَّآءٍ مَّهِينٍ ﴿٨﴾ ثُمَّ سَوَّىٰهُ وَنَفَخَ فِيهِ مِن رُّوحِهِۦ ۖ وَجَعَلَ لَكُمُ ٱلسَّمْعَ وَٱلْأَبْصَٰرَ وَٱلْأَفْـِٔدَةَ ۚ قَلِيلًا مَّا تَشْكُرُونَ ﴿٩﴾ وَقَالُوٓا۟ أَءِذَا ضَلَلْنَا فِى ٱلْأَرْضِ أَءِنَّا لَفِى خَلْقٍ جَدِيدٍۭ ۚ بَلْ هُم بِلِقَآءِ رَبِّهِمْ كَٰفِرُونَ ﴿١٠﴾ ۞ قُلْ يَتَوَفَّىٰكُم مَّلَكُ ٱلْمَوْتِ ٱلَّذِى وُكِّلَ بِكُمْ ثُمَّ إِلَىٰ رَبِّكُمْ تُرْجَعُونَ ﴿١١﴾



سورەتی (السجدة)

بەناوی خوای بەخشندە و میهرەبان

(١) سەرنجی سەرەتای سوورەتی (البقرة) بدە.

(٢) دابەزاندنی ئەم قورئانە لەلایەن پەروەردگاری جیهانیانەوە هیچ گومانی تێدانیە.

(٣) ئایا خوانەناسان دەڵێن: محمد ﷺ ئەم قورئانەی هەڵبەستووە؟ نەخێر وانییە، بەڵکو قورئان حەق و راستە و لەلایەن پەروەردگارتەوە نێردراوە، بۆ ئەوەی قەوم و هۆزێک بێدار بکەیتەوە کە پێش تۆ بێدارخەرەوەیەکیان بۆ نەهاتووە، تارێگەی هیدایەت و ئیمان بگرنەبەر.

(٤) خوا ئەو زاتەیە کە ئاسمانەکان و زەوی و هەرچی لە نێوانیاندا هەیە لە شەش رۆژدا دروستی کردووە (مەرج نیە درێژی ئەو رۆژانە بەقەدەر درێژی شەو و رۆژی زەوی بێت کە بە بیست و چوار سەعات جارێک بەدەوری خۆیدا دەسورێتەوە، چونکە هەندێک رۆژ هەروەک قورئان خۆی ئاماژەی بۆ دەکات هەزار ساڵە، هەندێکی تری پەنجا هەزار ساڵە)، پاشان خوا لەسەر تەختی فەرمانڕەواییەوە سەرپەرشتی کارو فرمانی دروستکراوانی دەکات و ئەوەی ئەو عیلمی پێی هەیە و دەیزانێت و دەیەوێت، هەر ئەوە پێش دێت،(سەرنجی ئایەتی -٢- الرعد بدە) ، خەڵکینە جگە لەو خوایەکەس نیە پشتیوانیتان لێ بکات یان تکا کارتان بێت، ئایا یاداوەری وەردەگرن و تێدەگەن.

(٥) ئەو خوایە لە ژوور ئاسمانەوە کاروباری زەوی رێک دەخات و سەرپەرشتی دەکات، لەوەودوا رووداوەکان و بەسەرهاتەکان و کارو کردەوەی بەندەکان دەگەڕێتەوە بۆ لای، لە رۆژێکدا کە بەرامبەر هەزار ساڵە بەو حسابەی ئێوە کە دەیکەن.

(٦) ئا ئەو خوایە زانایە بە نهێنی و ئاشکراکان، لە هەمان کاتدا خاوەن دەسەڵات و میهرەبانیشە.

(٧) ئەوخوایە زاتێکە هەموو شتێکی بەچاکی و رێکوپێکی بەدیهێناوە، لەسەرەتاوە ئادەمیزادی لە قوڕ دروست کردووە.

(٨) پاشان زنجیرەی نەوەکانی لە ئاوێکی سادە و بێنرخ بەدیهێناوە .

(٩) پاشان ئادەمیزادی بەرێک و پێکی رێکخست، لە رۆح و گیانێک کە خۆی خاوەنیەتی فووی پێداکرد، ئینجا دەزگای بیستن و بینین و لێکدانەوەی پێبەخشیون، کەمتان سوپاسگوزارن.

(١٠) (لەگەڵ ئەو هەموو بەڵگە بەهێزانەدا) خوانەناسان دەیانوت: ئایا ئەگەر مردین و بزر بووین لە توێی خاکی زەویدا، ئایا جارێکی تر سەرلەنوێ دروست دەکرێینەوە؟! نەخێر وون نابن! بەڵکو ئەوانە (هەر قسەی بەتاڵ و پڕوپوچ دەکەن ئەگینا لە بنەڕەتدا بە ئامادە بوونی بەردەم بارەگای پەروەردگاریان) بێباوەڕن ...

(١١) جا پێیان بڵێ: فریشتەی گیان کێشان کە کاری گیان کێشانتانی پێ سپێردراوە دەتانمرێنێت ، لەوەودوا بۆلای پەروەردگارتان دەبرێنەوە.

وَلَوْ تَرَىٰٓ إِذِ ٱلْمُجْرِمُونَ نَاكِسُوا۟ رُءُوسِهِمْ عِندَ رَبِّهِمْ رَبَّنَآ أَبْصَرْنَا وَسَمِعْنَا فَٱرْجِعْنَا نَعْمَلْ صَٰلِحًا إِنَّا مُوقِنُونَ ﴿١٢﴾ وَلَوْ شِئْنَا لَءَاتَيْنَا كُلَّ نَفْسٍ هُدَىٰهَا وَلَٰكِنْ حَقَّ ٱلْقَوْلُ مِنِّى لَأَمْلَأَنَّ جَهَنَّمَ مِنَ ٱلْجِنَّةِ وَٱلنَّاسِ أَجْمَعِينَ ﴿١٣﴾ فَذُوقُوا۟ بِمَا نَسِيتُمْ لِقَآءَ يَوْمِكُمْ هَٰذَآ إِنَّا نَسِينَٰكُمْ وَذُوقُوا۟ عَذَابَ ٱلْخُلْدِ بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴿١٤﴾ إِنَّمَا يُؤْمِنُ بِـَٔايَٰتِنَا ٱلَّذِينَ إِذَا ذُكِّرُوا۟ بِهَا خَرُّوا۟ سُجَّدًا وَسَبَّحُوا۟ بِحَمْدِ رَبِّهِمْ وَهُمْ لَا يَسْتَكْبِرُونَ ۩ ﴿١٥﴾ تَتَجَافَىٰ جُنُوبُهُمْ عَنِ ٱلْمَضَاجِعِ يَدْعُونَ رَبَّهُمْ خَوْفًا وَطَمَعًا وَمِمَّا رَزَقْنَٰهُمْ يُنفِقُونَ ﴿١٦﴾ فَلَا تَعْلَمُ نَفْسٌ مَّآ أُخْفِىَ لَهُم مِّن قُرَّةِ أَعْيُنٍ جَزَآءًۢ بِمَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴿١٧﴾ أَفَمَن كَانَ مُؤْمِنًا كَمَن كَانَ فَاسِقًا لَّا يَسْتَوُۥنَ ﴿١٨﴾ أَمَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ فَلَهُمْ جَنَّٰتُ ٱلْمَأْوَىٰ نُزُلًۢا بِمَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴿١٩﴾ وَأَمَّا ٱلَّذِينَ فَسَقُوا۟ فَمَأْوَىٰهُمُ ٱلنَّارُ كُلَّمَآ أَرَادُوٓا۟ أَن يَخْرُجُوا۟ مِنْهَآ أُعِيدُوا۟ فِيهَا وَقِيلَ لَهُمْ ذُوقُوا۟ عَذَابَ ٱلنَّارِ ٱلَّذِى كُنتُم بِهِۦ تُكَذِّبُونَ ﴿٢٠﴾

سجدة

(١٢) ئەگەر دەتبینی کاتێک ئەو تاوانبارانە (کە باوەڕیان بەزیندوو بوونەوە نەبوو) خەجاڵەت و سەرشۆڕن لەبەردەم دادگای خواییدا، دەڵێن: پەروەردگارا ئەوە ئیتر بەچاوی خۆمان بینیمان، بە گوێی خۆمان بیستمان ئەوەی بڕوامان پێی نەبوو، ئێستەش ئێمە بگێڕەوە بۆ دنیا مەرج بێت هەر کارو کردەوەی چاکە ئەنجام بدەین، ئێمە ئێستە تەواو دڵنیاین..!!

(١٣) بێگومان ئەگەر بمانویستایە هەموو کەسێکمان هیدایەت و ڕێنمویی دەکرد (بەناچاری و بەبێ ویستی خۆیان)، بەڵام بڕیاری من ئەوەیە (کە ئادەمیزاد و پەریەکان سەربەست و سەرپشک و ئازاد بکەم، سەرئەنجامیش) هەر دۆزەخ پڕ دەکەم لە پەریەکان و لە خەڵکی تێکڕا، (لەوانەی بڕوایان بە خواو پێغەمبەرەکانی نەبوو).

(١٤) دەی کەواتە بچێژن مادەم ئێوە ئەم ڕۆژەتان فەرامۆش کرد، ئێمەش بەڕاستی ئێوە پشتگوێ دەخەین، بچێژن ئێش و سزای نەبڕاوە، لە سەرئەنجامی کارو کردەوەیەک کە دەتانکرد.

(١٥) بەڕاستی تەنها ئەوانە بڕوا بە ئایەتەکانی ئێمە دەهێنن، کاتێک یاداوەری دەکرێن پێی، خێرا سوژدە دەبەن تەسبیحات و سوپاسگوزاری پەروەردگاریان دەکەن، لە کاتێکدا ئەوانە بە هیچ شێوەیەک فیزیان نیە و خۆیان بەگەورە نازانن.

(١٦) (ئەو ئیماندارە بەختەوەرانە) ئێوانیان خۆش نیە لەگەڵ ڕاکشان لە جێگەو ڕێگەی گەرم ونەرما (واتە بەنوێژو خواپەرستی بەشێکی شەو دەبەنە سەر)، هەمیشە نزاو پاڕانەوەیان ڕوو بە پەروەردگاریانە لە خەشم و قین و دۆزەخی دەترسن، ئاواتی ڕەزامەندی و بەهەشتیان هەیە و لەو ڕزق و ڕۆزی و توانایی و زانیاریەی پێمان بەخشیوون دەبەخشن.

(١٧) جا هیچ کەس لەو بەختەوەرانە نازانێت چی بۆهەڵگیراوە وشاراوەتەوە لە نازو نیعمەتی جۆراوجۆر لای پەروەردگاری، کە چاوان پێی گەش دەبنەوە و بەدیتنی شاد دەبن، لە پاداشتی کارو کردەوەی چاک و پاکیاندا کە ئەنجامیان دەدا.

(١٨) ئایا ئەو کەسەی ئیماندار بوو بێت وەک ئەو کەسەیە کە تاوانبار بوو بێت؟ وەک یەک نین..

(١٩) بەڵکو ئەوانەی کە باوەڕیان هێناوە و کردەوە چاکەکانیان ئەنجامداوە، شوێنیان باخچەکانی بەهەشتە (کە بۆ هەمیشە جێگەی حەوانەوە و حەسانەوەیانە)، هەر لەوێ دادەبەزن، لە پاداشتی کارو کردەوەیەک کە دەیانکرد.

(٢٠) ئەوانەش تاوانبارو یاخی بوون، شوێنیان ناو ئاگری دۆزەخە، هەر کاتێک ویستیان لێی دەرچن، دەگێڕدرێنەوە بۆ ناوی، پێیان دەوترێت: بچێژن سزای ئەو ئاگرەی کە بڕواتان پێی نەبوو.

وَلَنُذِيقَنَّهُم مِّنَ ٱلْعَذَابِ ٱلْأَدْنَىٰ دُونَ ٱلْعَذَابِ ٱلْأَكْبَرِ
لَعَلَّهُمْ يَرْجِعُونَ ﴿٢١﴾ وَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّن ذُكِّرَ بِـَٔايَٰتِ رَبِّهِۦ ثُمَّ
أَعْرَضَ عَنْهَآ إِنَّا مِنَ ٱلْمُجْرِمِينَ مُنتَقِمُونَ ﴿٢٢﴾ وَلَقَدْ ءَاتَيْنَا
مُوسَى ٱلْكِتَٰبَ فَلَا تَكُن فِى مِرْيَةٍ مِّن لِّقَآئِهِۦ وَجَعَلْنَٰهُ
هُدًى لِّبَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ ﴿٢٣﴾ وَجَعَلْنَا مِنْهُمْ أَئِمَّةً يَهْدُونَ
بِأَمْرِنَا لَمَّا صَبَرُوا۟ وَكَانُوا۟ بِـَٔايَٰتِنَا يُوقِنُونَ ﴿٢٤﴾ إِنَّ رَبَّكَ
هُوَ يَفْصِلُ بَيْنَهُمْ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ فِيمَا كَانُوا۟ فِيهِ يَخْتَلِفُونَ
﴿٢٥﴾ أَوَلَمْ يَهْدِ لَهُمْ كَمْ أَهْلَكْنَا مِن قَبْلِهِم مِّنَ ٱلْقُرُونِ
يَمْشُونَ فِى مَسَٰكِنِهِمْ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَٰتٍ أَفَلَا يَسْمَعُونَ
﴿٢٦﴾ أَوَلَمْ يَرَوْا۟ أَنَّا نَسُوقُ ٱلْمَآءَ إِلَى ٱلْأَرْضِ ٱلْجُرُزِ فَنُخْرِجُ
بِهِۦ زَرْعًا تَأْكُلُ مِنْهُ أَنْعَٰمُهُمْ وَأَنفُسُهُمْ أَفَلَا يُبْصِرُونَ ﴿٢٧﴾
وَيَقُولُونَ مَتَىٰ هَٰذَا ٱلْفَتْحُ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ ﴿٢٨﴾
قُلْ يَوْمَ ٱلْفَتْحِ لَا يَنفَعُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓا۟ إِيمَٰنُهُمْ وَلَا هُمْ يُنظَرُونَ
﴿٢٩﴾ فَأَعْرِضْ عَنْهُمْ وَٱنتَظِرْ إِنَّهُم مُّنتَظِرُونَ ﴿٣٠﴾

سُورَةُ الأَحْزَابِ

(٢١) سوێند بە خوا ئێمە تاڵاو لە دنیادا دەکەین بەگەرویاندا، بێجگە لە سزای ریشەکەنکردنیان، بۆئەوەی هۆش و بیربکەنەوەو بیرێک بکەنەوە و بگەڕێنەوە بۆ لای ئیمان.

(٢٢) جا کێ لەو کەسە ستەمکارترە کە بە فەرموودەکانی خوا یاداوەری و ئامۆژگاری کرابێت، پاشان پشتی لێ هەڵکربێت و گوێی پێنەدات، بەڕاستی ئێمە تۆڵە لە تاوانباروو تاوانکاران دەستێنین.

(٢٣) سوێند بە خوا بەڕاستی ئێمە تەوراتمان بەخشی بە موسا، تۆ (ئەی محمد ﷺ) هیچ گومانت نەبێت لە دیداری موساو لەوەش کە تەورات لەلایەن ئێمەوە بەخشراوە بەو، ئەو کاتە ئێمە تەوراتمان کرد بە ڕێنموویی بۆ نەوەی ئیسرائیل.

(٢٤) پاشان کە نەوەی ئیسرائیل خۆگری و ئارامیان کردە پیشەیان کردمانن بە پێشەواو دەسەڵاتمان پێبەخشین، ئەو کاتە دڵنیایی و بروایەکی تەواویان هەبوو بە ئایەتەکانی ئێمە (شایستەی ئەو ڕێزە بوون).

(٢٥) بەڕاستی پەروەردگارت خۆی (دوای ئەوەی کە بوونە چەندەها دەستە وگرۆ) لە رۆژی قیامەتدا لەیەک جیایان دەکاتەوە، چاک و خراپیان دیاری دەکات لەو شتانەدا کەوا ئەوان کێشەیان تێدا دەکرد و رووبەڕوی یەک دەبوونەوە و بەرامبەر یەک دەوەستانەوە.

(٢٦) ئایا ئەوە پەندو ئامۆژگاری وەرناگرن لەوەی: ئێمە پێش ئەمان چەندەها جیل و نەوەمان لەناوبردوە، بەناوماڵەکانیاندا دێن و دەچن، بەڕاستی ئا لەو دیمەنانەدا بەڵگەی زۆر بەهێز هەیە لەسەر دەسەڵاتی ئێمە، ئایا ئەوە نابیسن؟!

(٢٧) ئایا سەرنجیان نەداوە کە بەڕاستی چۆن ئێمە ئاوکێش دەکەین و دەیبەین بۆ زەوی وزاری وشک و بێ رووەک جا بەو ئاوە رووەک و گژوگیا دەردەهێنین کە ماڵاتیان و خۆیشیان لێی دەخۆن، ئایا ئەوە نابینن و سەرنج نادەن؟!

(٢٨) بێ باوەڕان دەڵێن: باشە؛ ئەوە کەی ئەم جیاکردنەوە و سەرکەوتنی ئیمانداران پێش دێت، ئەگەر راست دەکەن؟!

(٢٩) ئەی محمد ﷺ پێیان بڵێ: رۆژی جیاکردنەوە و سەرکەوتنی ئیمان، باوەڕهێنانی کافران هیچ سوودی نابێت بۆیان، هیچ مۆڵەتیشیان نادرێت (پەشیمانییش سوودی نابێت).

(٣٠) جا تۆ روویان لێ وەرگێڕە و گوێیان مەدەرێ، بەڵکو چاوەڕوان بە، بەڕاستی ئەوانە چاوەڕوانن!!

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ ٱتَّقِ ٱللَّهَ وَلَا تُطِعِ ٱلۡكَٰفِرِينَ وَٱلۡمُنَٰفِقِينَۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلِيمًا حَكِيمٗا ﴿١﴾ وَٱتَّبِعۡ مَا يُوحَىٰٓ إِلَيۡكَ مِن رَّبِّكَۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ بِمَا تَعۡمَلُونَ خَبِيرٗا ﴿٢﴾ وَتَوَكَّلۡ عَلَى ٱللَّهِۚ وَكَفَىٰ بِٱللَّهِ وَكِيلٗا ﴿٣﴾ مَّا جَعَلَ ٱللَّهُ لِرَجُلٖ مِّن قَلۡبَيۡنِ فِي جَوۡفِهِۦۚ وَمَا جَعَلَ أَزۡوَٰجَكُمُ ٱلَّٰٓـِٔي تُظَٰهِرُونَ مِنۡهُنَّ أُمَّهَٰتِكُمۡۚ وَمَا جَعَلَ أَدۡعِيَآءَكُمۡ أَبۡنَآءَكُمۡۚ ذَٰلِكُمۡ قَوۡلُكُم بِأَفۡوَٰهِكُمۡۖ وَٱللَّهُ يَقُولُ ٱلۡحَقَّ وَهُوَ يَهۡدِي ٱلسَّبِيلَ ﴿٤﴾ ٱدۡعُوهُمۡ لِأٓبَآئِهِمۡ هُوَ أَقۡسَطُ عِندَ ٱللَّهِۚ فَإِن لَّمۡ تَعۡلَمُوٓاْ ءَابَآءَهُمۡ فَإِخۡوَٰنُكُمۡ فِي ٱلدِّينِ وَمَوَٰلِيكُمۡۚ وَلَيۡسَ عَلَيۡكُمۡ جُنَاحٞ فِيمَآ أَخۡطَأۡتُم بِهِۦ وَلَٰكِن مَّا تَعَمَّدَتۡ قُلُوبُكُمۡۚ وَكَانَ ٱللَّهُ غَفُورٗا رَّحِيمًا ﴿٥﴾ ٱلنَّبِيُّ أَوۡلَىٰ بِٱلۡمُؤۡمِنِينَ مِنۡ أَنفُسِهِمۡۖ وَأَزۡوَٰجُهُۥٓ أُمَّهَٰتُهُمۡۗ وَأُوْلُواْ ٱلۡأَرۡحَامِ بَعۡضُهُمۡ أَوۡلَىٰ بِبَعۡضٖ فِي كِتَٰبِ ٱللَّهِ مِنَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ وَٱلۡمُهَٰجِرِينَ إِلَّآ أَن تَفۡعَلُوٓاْ إِلَىٰٓ أَوۡلِيَآئِكُم مَّعۡرُوفٗاۚ كَانَ ذَٰلِكَ فِي ٱلۡكِتَٰبِ مَسۡطُورٗا ﴿٦﴾

**سورەتی (الأحــزاب)**

**بەناوی خوای بەخشندە و میهرەبان**

(١) ئەی پێغەمبەر ﷺ لە خوا بترسە و بەردەوام بە لەسەر تـەقواو پارێزکاری، هـەرگیز ملکـەچی بێباوەڕان و دووڕووەکان مەبە (کە دەیانەوێت لـە ڕێگەی ڕاست وێڵت بکـەن، چـونکە) بەڕاستی خوا هەمیشە و بـەردەوام زانا و دانایە.

(٢) بەڵکو تەنها شوێنی ئەو ڕێنموویيانە بکەوە کە لەلایەن پەروەردگارتەوە بـەنیگا بۆت ڕەوانـە دەکرێت، بەڕاسـتی خوا هەمیشـە ئاگادارە بـەو کردەوانەی کە ئەنجامی دەدەن.

(٣) هەمیشە و بەردەوام پشت بە خـوا ببەسـتە، تەنها خوا بەسە کە پشتیوان و یاریدەدەر بێت.

(٤) خوا دوودڵی دروست نەکردووە لـە دەروونـی هیچ کەسێکدا (دوو بیروباوەڕ جێـی نابێتـەوە)، ئەو هاوسەرانەتان کە پێیان دەڵێن: ئێـوە لـەجێی دایکمانن، خوا نەیکردوون بـەدایکتان، ئەوانـەش بەقسـەی خۆتـان دەیکـەن بـەکوڕی خۆتـان، خـوا نـەیکردوون بـەکوڕتان، ئەوانـە قسـەیەکن کـە بەزارتان دەیڵێـن، خـوایش حـەق وێـژە و هـەر ئـەو ڕێبازی ڕاست و دروست، نیشانی بەندەکانی دەدات.

(٥) ئەو کوڕانە بەناوی باوکی خۆیانەوە ناویان بـەرن و بانگیـان بکـەن، ئـەوە پەسـەندە لای خـوا، ئەگـەر باوکیانتـان نەدەناسی، خۆ بـرای دینیتـانن، سـەر بـەئێوەن و لـە ئێـوەن، (ئەگـەر دوور لـە سووکایەتی) هەڵەیـەکتان کـرد ئـەوە قەیناکات، بەڵام ئەگەر لە دڵتاندا، نیەتێکی ناپـاک هـەبێت بـۆ سـووکایەتی پێکردنیـان ئـەوە لێپرسینەوەی دەبێت، هەمیشەو بەردەوامیش خوا لێخۆشبوو میهرەبانە (لە هەڵەکانتان دەبورێت، ئەگەر لێی پەشیمان بنەوە).

(٦) پێغەمبەر ﷺ نزیکتر بە ئیمانداران لە خودی خۆیان (واتە دەبێت لە خۆیان زیاتر خۆشیان بوێـت و فەرمانـەکانی لە سەرو فەرمان و داخوازی خۆیانـەوە بێـت) خێزانەکانیشـی دایکیـانن (دایکـی ئیمـاندارانن، دایکـی مەعنـەویانن) خزمانیش هەندێکیان لە هەندێکی تریان لە پێشترن، لە قورئانی خـوادا، لـە ئیمـانداران و کۆچـەران، مەگـەر لەگـەڵ دۆستان و خزمان و ئاشنایانی خۆتان کارێکی چاک ئەنجام بـدەن، ئـەو چاکەیـەتان لـە نامـەی کردەوەکانتـاندا بۆتـان تۆمارکراوە.

وَإِذْ أَخَذْنَا مِنَ ٱلنَّبِيِّـۧنَ مِيثَـٰقَهُمْ وَمِنكَ وَمِن نُّوحٍ وَإِبْرَٰهِيمَ وَمُوسَىٰ وَعِيسَى ٱبْنِ مَرْيَمَ ۖ وَأَخَذْنَا مِنْهُم مِّيثَـٰقًا غَلِيظًا ﴿٧﴾ لِّيَسْـَٔلَ ٱلصَّـٰدِقِينَ عَن صِدْقِهِمْ ۚ وَأَعَدَّ لِلْكَـٰفِرِينَ عَذَابًا أَلِيمًا ﴿٨﴾ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱذْكُرُوا۟ نِعْمَةَ ٱللَّهِ عَلَيْكُمْ إِذْ جَآءَتْكُمْ جُنُودٌ فَأَرْسَلْنَا عَلَيْهِمْ رِيحًا وَجُنُودًا لَّمْ تَرَوْهَا ۚ وَكَانَ ٱللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرًا ﴿٩﴾ إِذْ جَآءُوكُم مِّن فَوْقِكُمْ وَمِنْ أَسْفَلَ مِنكُمْ وَإِذْ زَاغَتِ ٱلْأَبْصَـٰرُ وَبَلَغَتِ ٱلْقُلُوبُ ٱلْحَنَاجِرَ وَتَظُنُّونَ بِٱللَّهِ ٱلظُّنُونَا۠ ﴿١٠﴾ هُنَالِكَ ٱبْتُلِىَ ٱلْمُؤْمِنُونَ وَزُلْزِلُوا۟ زِلْزَالًا شَدِيدًا ﴿١١﴾ وَإِذْ يَقُولُ ٱلْمُنَـٰفِقُونَ وَٱلَّذِينَ فِى قُلُوبِهِم مَّرَضٌ مَّا وَعَدَنَا ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥٓ إِلَّا غُرُورًا ﴿١٢﴾ وَإِذْ قَالَت طَّآئِفَةٌ مِّنْهُمْ يَـٰٓأَهْلَ يَثْرِبَ لَا مُقَامَ لَكُمْ فَٱرْجِعُوا۟ ۚ وَيَسْتَـْٔذِنُ فَرِيقٌ مِّنْهُمُ ٱلنَّبِىَّ يَقُولُونَ إِنَّ بُيُوتَنَا عَوْرَةٌ وَمَا هِىَ بِعَوْرَةٍ ۖ إِن يُرِيدُونَ إِلَّا فِرَارًا ﴿١٣﴾ وَلَوْ دُخِلَتْ عَلَيْهِم مِّنْ أَقْطَارِهَا ثُمَّ سُئِلُوا۟ ٱلْفِتْنَةَ لَـَٔاتَوْهَا وَمَا تَلَبَّثُوا۟ بِهَآ إِلَّا يَسِيرًا ﴿١٤﴾ وَلَقَدْ كَانُوا۟ عَـٰهَدُوا۟ ٱللَّهَ مِن قَبْلُ لَا يُوَلُّونَ ٱلْأَدْبَـٰرَ ۚ وَكَانَ عَهْدُ ٱللَّهِ مَسْـُٔولًا ﴿١٥﴾

(٧) (بیریان بخەرەوە کە ئێمە) پەیمانمان لە پێغەمبەران وەرگرتووە پەیمانی یەکتاپەرستی، پەیمانی گەیاندنی بانگەوازی خوا، بە تایبەت لە تۆ ئەی محمد ﷺ و لە نوح و ئیبراهیم و موسا و عیسای کوڕی مەریەم، بێگومان پەیمانێکی بە هێزو پتەومان لێ وەرگرتن...

(٨) تا لە ڕۆژی قیامەتدا، خوا پرسیار بکات لە ڕاستگۆیان دەربارەی ڕاستیەکەیان (واتە لە پێغەمبەران دەربارەی گەیاندنی پەیامەکەیان)، بۆ کافرانیش سزاو تۆڵەیەکی بە ئێشی ئامادە کردووە.

(٩) ئەی ئەوانەی ئیمان و باوەڕتان هێناوە یادی نیعمەتی خوا بکەنەوە لەسەرتان (مەبەست جەنگی خەندەقە کە خوای گەورە فریای ئیمانداران کەوت)، کاتێک سەربازانی کوفر هاتنە سەرتان ئێمەش ڕەشەبایەکی بەهێزو سەربازانێکمان ناردە سەریان کە نەتاندەبینین، خوای گەورە بینابوو بەهەوڵ و کۆششتان (چۆن پاسەوانیتان دەکرد، چۆن ئەو چاڵە قووڵ و درێژەتان هەڵکەند..هتد).

(١٠) کاتێکیش دوژمنان لە سەرو خوارتانەوە هاتنە سەرتان، کاتێکیش چاوەکان ئەبڵەق بوون، دڵەکان گەشتبوونە گەروو، گومانی جۆراو جۆرتان دەبرد بە بەڵێنەکانی خوای گەورە (بە سەرکەوتنی ئیمانداران).

(١١) لەوێدا ئیمانداران تاقی کرانەوە و تووشی تەنگانە و سەختیەکی زۆر توندو بەهێز بوون، تووشی دڵە لەرزەیەکی زۆر سەخت کران.

(١٢) کاتێکیش دووڕووەکان و ئەوانەی دڵیان نەخۆشی گومانی تێدابوو دەیانوت: بەڵێنی خواو پێغەمبەرەکەی تەنها بۆ خەڵەتەنادن بوو، هیچی تر نەبوو؟!

(١٣) کاتێکیش هەندێک لە دووڕووەکان وتیان: ئەی خەڵکی یثریب، ئەمە هیچ شوێنی ئێوە نیە، بگەڕێنەوە ناو شار، دەستەیەکیش لەوان مۆڵەتیان لە پێغەمبەر دەخواست و دەیانوت: ماڵەکانمان بەدەرەوەیە (گوایە دوژمن بە ئاسانی دەتوانێت هەڵکوتێتە سەری)، لە ڕاستیدا وانیە، ماڵەکانیان بەدەرەوە نین (دوژمن ناتوانێت زەفەریان پێ بەرێت)، تەنها ڕاکردنیان مەبەستەو هیچی تر.

(١٤) خۆ ئەگەر لەشکری دوژمنان لە چوارلای یثریبەوە بچونایەتە سەریان، لەوەودوا داوای جەنگیان لێبکرایە دژی موسوڵمانان، ئەوە دەچوون بەدەمیەوە، تەنها کەمێک نەبێت وەڵامەکەیان دوا نەدەخست.

(١٥) سوێند بە خوا بەراستی زووتر ئەوانە پەیمانیان بەخوای گەورە دابوو پشت هەڵنەکەن لەکاتی بەرەنگاری دوژمندا، بێگومان بەڵێنێک بەخوا درابێت لێی دەپرسرێتەوە.

قُل لَّن يَنفَعَكُمُ ٱلْفِرَارُ إِن فَرَرْتُم مِّنَ ٱلْمَوْتِ أَوِ ٱلْقَتْلِ وَإِذًا لَّا تُمَتَّعُونَ إِلَّا قَلِيلًا ﴿١٦﴾ قُلْ مَن ذَا ٱلَّذِى يَعْصِمُكُم مِّنَ ٱللَّهِ إِنْ أَرَادَ بِكُمْ سُوٓءًا أَوْ أَرَادَ بِكُمْ رَحْمَةً ۚ وَلَا يَجِدُونَ لَهُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ وَلِيًّا وَلَا نَصِيرًا ﴿١٧﴾ ۞ قَدْ يَعْلَمُ ٱللَّهُ ٱلْمُعَوِّقِينَ مِنكُمْ وَٱلْقَآئِلِينَ لِإِخْوَٰنِهِمْ هَلُمَّ إِلَيْنَا ۖ وَلَا يَأْتُونَ ٱلْبَأْسَ إِلَّا قَلِيلًا ﴿١٨﴾ أَشِحَّةً عَلَيْكُمْ ۖ فَإِذَا جَآءَ ٱلْخَوْفُ رَأَيْتَهُمْ يَنظُرُونَ إِلَيْكَ تَدُورُ أَعْيُنُهُمْ كَٱلَّذِى يُغْشَىٰ عَلَيْهِ مِنَ ٱلْمَوْتِ ۖ فَإِذَا ذَهَبَ ٱلْخَوْفُ سَلَقُوكُم بِأَلْسِنَةٍ حِدَادٍ أَشِحَّةً عَلَى ٱلْخَيْرِ ۚ أُو۟لَٰٓئِكَ لَمْ يُؤْمِنُوا۟ فَأَحْبَطَ ٱللَّهُ أَعْمَٰلَهُمْ ۚ وَكَانَ ذَٰلِكَ عَلَى ٱللَّهِ يَسِيرًا ﴿١٩﴾ يَحْسَبُونَ ٱلْأَحْزَابَ لَمْ يَذْهَبُوا۟ ۖ وَإِن يَأْتِ ٱلْأَحْزَابُ يَوَدُّوا۟ لَوْ أَنَّهُم بَادُونَ فِى ٱلْأَعْرَابِ يَسْـَٔلُونَ عَنْ أَنۢبَآئِكُمْ ۖ وَلَوْ كَانُوا۟ فِيكُم مَّا قَٰتَلُوٓا۟ إِلَّا قَلِيلًا ﴿٢٠﴾ لَّقَدْ كَانَ لَكُمْ فِى رَسُولِ ٱللَّهِ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ لِّمَن كَانَ يَرْجُوا۟ ٱللَّهَ وَٱلْيَوْمَ ٱلْءَاخِرَ وَذَكَرَ ٱللَّهَ كَثِيرًا ﴿٢١﴾ وَلَمَّا رَءَا ٱلْمُؤْمِنُونَ ٱلْأَحْزَابَ قَالُوا۟ هَٰذَا مَا وَعَدَنَا ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥ وَصَدَقَ ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥ ۚ وَمَا زَادَهُمْ إِلَّآ إِيمَٰنًا وَتَسْلِيمًا ﴿٢٢﴾



(١٦) پێیان بڵێ: (ئەی پێغەمبەر ﷺ) هەرگیز راکردن، سوود بەخش نابێت بۆتان ئەگەر هەڵبێن لە مردن، یان لە کوشتن، ئەوسا تەنها کەمێک نەبێت دوانا خرێن و رابواردن و ژیانتان زۆر کەم و کورتایە.

(١٧) پێیان بڵێ: کێ هەیە پەناتان بدات لە خواو بتانپارێزێت لە تۆڵەسەندنەوەی، ئەگەر بیەوێت ناخۆشیەکتان بۆ پێش بهێنێت، یاخود کێ هەیە دەتوانێت بەری میهرەبانی وسۆزی بگرێت، ئەگەر بیەوێت بەزەیی و رەحمەتی خۆیتان پێ ببەخشێت، ئەو کاتە ئیتر ئەوانە جگە لە خوا کەسیان دەست ناکەوێت پشتیوانییان لێ بکات و سەریان بخات.

(١٨) بەراستی خوا ئەو کەسانە دەناسێت کە کۆسپ و تەگەرە دروست دەکەن لە ئێوە، ئەوانەی بە براکانیان دەڵێن وەرن بۆ لای ئێمە، (خۆتان بدزنەوە لە سوپای ئیمانداران)، ئەوانە تەنها کەم نەبێت خۆیان ناخەنە ناو تالوکەی جەنگەوە.

(١٩) بەرامبەر ئێوە دەست نوقاوو بێ هیمەتن، جا کاتێک ترس و بیمی جەنگیان بۆ دێت ئەوە دەیانبینیت، تەماشات دەکەن، چاوەکانیان دەسورێتەوە و ئەبلەق دەبێت وەک کەسێک لە ترسی مەرگ بێ هۆشی بەسەردا هاتبێت، جا کاتێک ئەو ترس و بیمە نەما، زمان درێژەکانیان نازارتان دەدەن بەقسەی رەق و ناخۆش، لە کاتێکدا ئەوان چاو برسیی و بەهەڵپەن بۆ پارە، ئا ئەوانە باوەڕیان نەهێناوە، بەو هۆیەوە خوا کردەوەکانیان پووچ کردنەوە، ئەو کارەش هەمیشە بۆ خوا ئاسانە.

(٢٠) ئەوانە هێشتا وادەزانن کە لەشکر و گرۆ و دەستەکان نەڕۆیشتوون، ئەگەر لەشکری گرۆکان هات، ئاوات دەخوازن بریا لەناو عەرەبە بیابان نشینەکاندا بوونایە و لەوێوە هەواڵی ئێوەیان بپرسیایە!! خۆ ئەگەر لەناو ئێوەدا بوونایە تەنها کەم نەبێت جەنگیان نەدەکرد.

(٢١) سوێند بەخوا بەراستی لە پێغەمبەری خوادا چاکترین نموونەی تەواو و رێکوپێک هەیە تاچاوی لێ بکەن و شوێنی بکەون، بەتایبەت بۆ ئەو کەسانەی رەزامەندی خوایان مەبەستە، سەرفرازی قیامەت ئاواتیانە، هەمیشە و بەردەوام یادی خوا بەزۆری ئەنجام دەدەن و زمانیان پاراوە بەیادی ئەو.

(٢٢) کاتێک ئیمانداران ئەو هەموو دەستە و گرۆهانەیان بینی وتیان: ئەمە ئەوەیە کە خواو پێغەمبەرەکەی بەڵێنی پێداوین (کە ئاوا دژایەتی ئاینەکەی دەکرێت و کافران و دووڕووەکان نەخشەو پیلان دەکێشن بۆ ریشەکەن کردنی)، دیارەکە خوا و پێغەمبەرەکەی راستیان فەرموولە پێشهاتنیدا، بێگومان ئەو دژایەتیە باوەڕ وملکەچی نەبێت هیچی تری بۆ زیاد نەکردن (واتە سوورتر بوون لەسەر ئیمان).

مِّنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ رِجَالٌ صَدَقُوا۟ مَا عَٰهَدُوا۟ ٱللَّهَ عَلَيْهِ ۖ فَمِنْهُم مَّن قَضَىٰ نَحْبَهُۥ وَمِنْهُم مَّن يَنتَظِرُ ۖ وَمَا بَدَّلُوا۟ تَبْدِيلًا ﴿٢٣﴾ لِّيَجْزِىَ ٱللَّهُ ٱلصَّٰدِقِينَ بِصِدْقِهِمْ وَيُعَذِّبَ ٱلْمُنَٰفِقِينَ إِن شَآءَ أَوْ يَتُوبَ عَلَيْهِمْ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ غَفُورًا رَّحِيمًا ﴿٢٤﴾ وَرَدَّ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ بِغَيْظِهِمْ لَمْ يَنَالُوا۟ خَيْرًا ۚ وَكَفَى ٱللَّهُ ٱلْمُؤْمِنِينَ ٱلْقِتَالَ ۚ وَكَانَ ٱللَّهُ قَوِيًّا عَزِيزًا ﴿٢٥﴾ وَأَنزَلَ ٱلَّذِينَ ظَٰهَرُوهُم مِّنْ أَهْلِ ٱلْكِتَٰبِ مِن صَيَاصِيهِمْ وَقَذَفَ فِى قُلُوبِهِمُ ٱلرُّعْبَ فَرِيقًا تَقْتُلُونَ وَتَأْسِرُونَ فَرِيقًا ﴿٢٦﴾ وَأَوْرَثَكُمْ أَرْضَهُمْ وَدِيَٰرَهُمْ وَأَمْوَٰلَهُمْ وَأَرْضًا لَّمْ تَطَـُٔوهَا ۚ وَكَانَ ٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرًا ﴿٢٧﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِىُّ قُل لِّأَزْوَٰجِكَ إِن كُنتُنَّ تُرِدْنَ ٱلْحَيَوٰةَ ٱلدُّنْيَا وَزِينَتَهَا فَتَعَالَيْنَ أُمَتِّعْكُنَّ وَأُسَرِّحْكُنَّ سَرَاحًا جَمِيلًا ﴿٢٨﴾ وَإِن كُنتُنَّ تُرِدْنَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ وَٱلدَّارَ ٱلْءَاخِرَةَ فَإِنَّ ٱللَّهَ أَعَدَّ لِلْمُحْسِنَٰتِ مِنكُنَّ أَجْرًا عَظِيمًا ﴿٢٩﴾ يَٰنِسَآءَ ٱلنَّبِىِّ مَن يَأْتِ مِنكُنَّ بِفَٰحِشَةٍ مُّبَيِّنَةٍ يُضَٰعَفْ لَهَا ٱلْعَذَابُ ضِعْفَيْنِ ۚ وَكَانَ ذَٰلِكَ عَلَى ٱللَّهِ يَسِيرًا ﴿٣٠﴾

(٢٣) مەردانێکی زۆر هەن لە ئیمانداران ئەو پەیمانەی داویانە بە خوا، راستیان کرد لەسەری ژیان و پابەند بوون پێوەی و لایان نەدا لێی، جا هەیانە پەیمانەکەی جێبەجێ کردو مرد لەسەری ، هەشیانە چاوەروانە، بەهیچ شێوەیەک گۆڕان و لاری رووی تێ نەکردون.

(٢٤) تا خوای گەورە پاداشتی راستگۆیان بە هۆی راستیەکەیان بداتەوە، هەروەها سزاو تۆڵەی دووڕووەکانیش بدات ئەگەر بیەوێت، یان تەوبە و پەشیمانیان لێ وەردەگرێت، چونکە بەراستی خوا هەمیشە و بەردەوام لێخۆشبوو میهرەبانە.

(٢٥) خوا کافرانی تێکشکاند و گێرانیەوە دواوە بەخۆیان و کینە و بوغزیانەوە، هیچ جۆرە خێرێکیان دەست نەکەوت، هەر خوا خۆی ئیماندارانی لە جەنگ پاراست (هەر خۆیشی بە باو باران و لەشکری تایبەتی کافرانی تێک شکاند)، جا هەمیشە و بەردەوام خوا بەهێزە و بە دەسەڵاتە.

(٢٦) ئەوانەی پشتگیری قورەیشیەکانیان کرد لە خاوەنی کتێبە ئاسمانیەکان، لە جووەکانی (بنی قریضة) خوای گەورە لە قەڵاکانیان دایگرتن، ترس و بیمی فڕێدایە دڵیان، تا وایان لێهات، دەستەیەکتان کوشتن و دەستەیەکیشتان بەدیل گرتن.

(٢٧) سەرئەنجام هەرچی زەویوزار و ماڵ و خانوو سامانێکیان هەبوو خوا بەخشی بە ئێوە، هەروەها شوێنی تریش کە هێشتا تا ئێستا پێیدا نەڕۆشتوون، هەمیشە و بەردەوامیش خوا دەستی بەسەر هەموو شتێکدا دەڕوات. (بەپشتیوانی خوای گەورە رۆژێک دێت، پیلانگێڕان سەرشۆڕو ریسوا دەکات و هەرچی سامان و ماڵێک کە بە خیانەت و فێڵ بەدەستیان هێناوە، دەدرێتەوە بەخاوەنەکانی... جا ئەو رۆژە ئەم ئایەتانەی سوورەتی (احزاب) ٢١-٢٧ دەڵێی ئەو ساتە هاتۆتە خوارەوە).

(٢٨) ئەی پێغەمبەر بە هاوسەرانت بڵێ: ئەگەر ئێوە تەنها ژیانی دنیا و رازاوەییەکەیتان دەوێت، وەرن با هەندێک شتومەک و پارە و سامانتان پێ ببەخشم، لەوەودواش بە جوانترین شێوە دەست بەردارتان ببم.

(٢٩) خۆ ئەگەر ئێوە خواو پێغەمبەرەکەی و پاداشتی رۆژی قیامەتان دەوێت، ئەوە دڵنیابن کە خوا بۆ چاکەکارانتان پاداشتی زۆر گەورە و بێئەندازەی ئامادەکردووە (پێغەمبەرهەموو هاوسەرانی یەک یەک تاقیکردەوە هەموانیان خوا و پێغەمبەر و پاداشتی قیامەتیان هەڵبژارد).

(٣٠) ئەی هاوسەرانی پێغەمبەر: هەر کەس لە ئێوە بەگوناهێکی گەورەی ئاشکرا هەستێت، ئەوە با بزانێت کە دوو بەرابەر سزا دەدرێت، ئەوەش لای خوا زۆر ئاسانە چونکە ئێوە قەدر و رێزی تایبەتیتان هەیە.



﴿ وَمَن يَقْنُتْ مِنكُنَّ لِلَّهِ وَرَسُولِهِۦ وَتَعْمَلْ صَٰلِحًا نُّؤْتِهَآ أَجْرَهَا مَرَّتَيْنِ وَأَعْتَدْنَا لَهَا رِزْقًا كَرِيمًا ﴿٣١﴾ يَٰنِسَآءَ ٱلنَّبِىِّ لَسْتُنَّ كَأَحَدٍ مِّنَ ٱلنِّسَآءِ إِنِ ٱتَّقَيْتُنَّ فَلَا تَخْضَعْنَ بِٱلْقَوْلِ فَيَطْمَعَ ٱلَّذِى فِى قَلْبِهِۦ مَرَضٌ وَقُلْنَ قَوْلًا مَّعْرُوفًا ﴿٣٢﴾ وَقَرْنَ فِى بُيُوتِكُنَّ وَلَا تَبَرَّجْنَ تَبَرُّجَ ٱلْجَٰهِلِيَّةِ ٱلْأُولَىٰ وَأَقِمْنَ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتِينَ ٱلزَّكَوٰةَ وَأَطِعْنَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥٓ إِنَّمَا يُرِيدُ ٱللَّهُ لِيُذْهِبَ عَنكُمُ ٱلرِّجْسَ أَهْلَ ٱلْبَيْتِ وَيُطَهِّرَكُمْ تَطْهِيرًا ﴿٣٣﴾ وَٱذْكُرْنَ مَا يُتْلَىٰ فِى بُيُوتِكُنَّ مِنْ ءَايَٰتِ ٱللَّهِ وَٱلْحِكْمَةِ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ لَطِيفًا خَبِيرًا ﴿٣٤﴾ إِنَّ ٱلْمُسْلِمِينَ وَٱلْمُسْلِمَٰتِ وَٱلْمُؤْمِنِينَ وَٱلْمُؤْمِنَٰتِ وَٱلْقَٰنِتِينَ وَٱلْقَٰنِتَٰتِ وَٱلصَّٰدِقِينَ وَٱلصَّٰدِقَٰتِ وَٱلصَّٰبِرِينَ وَٱلصَّٰبِرَٰتِ وَٱلْخَٰشِعِينَ وَٱلْخَٰشِعَٰتِ وَٱلْمُتَصَدِّقِينَ وَٱلْمُتَصَدِّقَٰتِ وَٱلصَّٰٓئِمِينَ وَٱلصَّٰٓئِمَٰتِ وَٱلْحَٰفِظِينَ فُرُوجَهُمْ وَٱلْحَٰفِظَٰتِ وَٱلذَّٰكِرِينَ ٱللَّهَ كَثِيرًا وَٱلذَّٰكِرَٰتِ أَعَدَّ ٱللَّهُ لَهُم مَّغْفِرَةً وَأَجْرًا عَظِيمًا ﴿٣٥﴾

(٣١) ئەوەشتان فەرمانبەردارو ملکەچی خواو پێغەمبەرەکەی بێت، کردەوەی چاکیش ئەنجام بدات ئەوە دووجار پاداشتی دەدەینەوە، هەروەها رزق و رۆزیەکی بەنرخ و پیرۆزمان لە بەهەشتدا بۆ ئامادە کردووە.

(٣٢) ئەی ژنانی پێغەمبەر ﷺ، ئێوە وەک هیچ ئافرەتێکی تر نین، ئەگەر بە تەواوی ترسی خوا لە دڵ و دەروونتاندا هەیە قسە بە ناسکی و شێوەیەک مەکەن، ئەوەکو ئەوەی دڵی نەخۆشە بووروژێت و نیازی خراپ بکات، هەمیشە و بەردەوامیش قسەی چاک و بەجێ بکەن (کە هیچ کەس نەتوانێت رەخنەی لێبگرێت).

(٣٣) ئەی هاوسەرانی پێغەمبەر ﷺ لەماڵەکانی خۆتاندا بە سەنگینی و سەلاری بمرەون، زینەت و جوانی خۆتان دەرمەخەن وەکو سەردەمی نەفامی یەکەم، نوێژەکانیشتان بە چاکی ئەنجام بدەن و زەکات بدەن (لە ماڵ و سامان)، فەرمانبەرداری خواو پێغەمبەرەکەشی بن، چونکە بەڕاستی خوا تەنها دەیەوێت هەموو ناپاکی و ناسازی و نادروستیەک لە ئێوە دووربخاتەوە ئەی خاوو خێزانی ماڵی پێغەمبەرو بە تەواوی پاکتان بکاتەوە (دوور لە هەموو ناتەواوی و قسەو قسەلۆکێک).

(٣٤) هەرچی لە ماڵەکانتاندا دەخوێنرێتەوە لە قورئان و فەرموودە یادی بگرن و فەرامۆشی مەکەن و باسی بکەن بۆ خەڵکی، بەڕاستی خوا هەمیشە و بەردەوام بە لوتف ووردبین و بەئاگایە (لە هەڵسوکەوتی بەندەکانی).

(٣٥) بەڕاستی پیاوان و ئافرەتانی موسڵمان، پیاوان و ئافرەتانی ئیماندار، پیاوان و ئافرەتانی ملکەچ و فەرمانبەردار، پیاوان و ئافرەتانی راستگۆ، پیاوان و ئافرەتانی خۆگر، پیاوان و ئافرەتانی لە خوا ترس، پیاوان و ئافرەتانی بەخشندە، پیاوان و ئافرەتانی رۆژووەوان، پیاوان و ئافرەتانی داوێن پاک و ئەو پیاوو ئافرەتانەی کە زۆر یادی خوا دەکەن، بەخشین و لێبووردەیی و پاداشتی زۆر مەزن و بێ سنووریان لەلایەن خوای گەورەوە بۆ ئامادە کراوە(هەر کە دنیایان بەجێ هێشت پێی شاد دەبن).

وَمَا كَانَ لِمُؤْمِنٍ وَلَا مُؤْمِنَةٍ إِذَا قَضَى اللَّهُ وَرَسُولُهُ أَمْرًا أَن يَكُونَ لَهُمُ الْخِيَرَةُ مِنْ أَمْرِهِمْ ۗ وَمَن يَعْصِ اللَّهَ وَرَسُولَهُ فَقَدْ ضَلَّ ضَلَالًا مُّبِينًا ﴿٣٦﴾ وَإِذْ تَقُولُ لِلَّذِي أَنْعَمَ اللَّهُ عَلَيْهِ وَأَنْعَمْتَ عَلَيْهِ أَمْسِكْ عَلَيْكَ زَوْجَكَ وَاتَّقِ اللَّهَ وَتُخْفِي فِي نَفْسِكَ مَا اللَّهُ مُبْدِيهِ وَتَخْشَى النَّاسَ وَاللَّهُ أَحَقُّ أَن تَخْشَاهُ ۖ فَلَمَّا قَضَىٰ زَيْدٌ مِّنْهَا وَطَرًا زَوَّجْنَاكَهَا لِكَيْ لَا يَكُونَ عَلَى الْمُؤْمِنِينَ حَرَجٌ فِي أَزْوَاجِ أَدْعِيَائِهِمْ إِذَا قَضَوْا مِنْهُنَّ وَطَرًا ۚ وَكَانَ أَمْرُ اللَّهِ مَفْعُولًا ﴿٣٧﴾ مَّا كَانَ عَلَى النَّبِيِّ مِنْ حَرَجٍ فِيمَا فَرَضَ اللَّهُ لَهُ ۖ سُنَّةَ اللَّهِ فِي الَّذِينَ خَلَوْا مِن قَبْلُ ۚ وَكَانَ أَمْرُ اللَّهِ قَدَرًا مَّقْدُورًا ﴿٣٨﴾ الَّذِينَ يُبَلِّغُونَ رِسَالَاتِ اللَّهِ وَيَخْشَوْنَهُ وَلَا يَخْشَوْنَ أَحَدًا إِلَّا اللَّهَ ۗ وَكَفَىٰ بِاللَّهِ حَسِيبًا ﴿٣٩﴾ مَّا كَانَ مُحَمَّدٌ أَبَا أَحَدٍ مِّن رِّجَالِكُمْ وَلَٰكِن رَّسُولَ اللَّهِ وَخَاتَمَ النَّبِيِّينَ ۗ وَكَانَ اللَّهُ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمًا ﴿٤٠﴾ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اذْكُرُوا اللَّهَ ذِكْرًا كَثِيرًا ﴿٤١﴾ وَسَبِّحُوهُ بُكْرَةً وَأَصِيلًا ﴿٤٢﴾ هُوَ الَّذِي يُصَلِّي عَلَيْكُمْ وَمَلَائِكَتُهُ لِيُخْرِجَكُم مِّنَ الظُّلُمَاتِ إِلَى النُّورِ ۚ وَكَانَ بِالْمُؤْمِنِينَ رَحِيمًا ﴿٤٣﴾

(٣٦) بۆ هیچ پیاو و ئافرەتێکی ئیماندار دروست نیە، کاتێک خواو پێغەمبەرەکەی بڕیاری شتێک بدەن، ئەوان سەرپشک بن لە ئەنجامدانی ئەوکارەدا، چونکە ئەوەی سەرپێچی بکات لە فەرمانی خواو پێغەمبەرەکەی ئەوە بەراستی بە ئاشکرا، گومڕاو سەرلێشێواوە.

(٣٧) ئەی محمد ﷺ باسی ئەوە بکە کاتێک کە دەتوت بەو کەسەی خوا نیعمەتی ئیمانی پێ بەخشیوە و تۆش نیعمەتی ئازادی و پەروەردەت لە نزیکی خۆتەوە پێداوە: هاوسەری خۆت بهێڵەرەوە لای خۆت کە (زەینەب)ە، لە خوا بترسە و (تەڵاقی مەدە)، ئەی محمد ﷺ شتێک لە دڵ و دەروونی خۆتدا دەشاریتەوە کە خوا دەیەوێت ئاشکرای بکات، لە خەڵکی دەترسیت (کە دەنگ و باست بۆ دروست بکەن، ژنی بەناو کوڕەکەت مارە دەکەیت) بەڵام خوا لە پێشترە کە حسابی بۆ بکەیت و لێی بترسیت، جا کاتێک زەید؛ بێزار بوو لە زەینەب و پێویستی پێی نەماو جیابوونەوە و تەڵاق کەوتە نێوانیان، ئێمە زەینەبمان لە تۆ مارەکرد، بۆ ئەوەی هیچ شەرمەزاری و دڵ تەنگیەک بۆ ئیمانداران دروست نەبێت، لە هێنانی هاوسەرانی بەناو کوڕیان، کاتێک بێزار دەبن و پێویستیان بە یەکتر نامێنێت، هەمیشە فەرمانی خوا جێبەجێ کراوە.

(٣٨) هیچ گوناهو هەڵەیەک لەسەر پێغەمبەر نیە لە بەرامبەر کارێکەوە کە خوا کردوویەتی بەئەرکی سەرشانی، بێگومان ئەم جۆرە پێشهات و ڕووداوانە بەرنامەی خوایە و لە پێغەمبەران و قەومە پێشووەکانیشدا ڕووی داوە (کە عەقیدە و بیروباوەڕیان ڕاست کراوەتەوە هەروەها پەیوەندیە کۆمەڵایەتی و ئابووری و ڕامیاریەکانیشیان بەگوێرەی بەرنامەی خوا سازدراوە)، بەردەوامیش کارو فەرمانەکانی خوا بڕیار لەسەر دراوە ...

(٣٩) ئەوانەی کە پەیامەکانی خوا دەگەیەنن و لەو دەترسن و جگە لەو لە هیچ کەسی تر ناترسن، خوا خۆی بەسە کە پاداشتی چاکەکاران بداتەوە و لە بێباوەڕانیش بپرسێتەوە.

(٤٠) محمد باوکی هیچ کەس لە پیاوانتان بێت، بەڵکو پێغەمبەری خوایە و دواهەمینی پێغەمبەرانە، هەمیشە و بەردەوامیش خوا بە هەموو شتێک زانایە.

(٤١) ئەی ئەو کەسانەی ئیمان و باوەڕتان هێناوە زۆر زۆر یادی خوا بکەن (هەمیشە ناوی پیرۆزی ئەوتان لەیاد بێت لە دڵ و دەروونتاندا جۆش بخوات وبێتە سەر زارتان).

(٤٢) وە تەسبیحات و ستایشی بکەن، (هەموو کاتێک ، بەتایبەت) لە بەیانیان و دەمە و ئێواراندا.

(٤٣) هەر ئەو زاتە خۆی سڵاوات و ڕەحمەتی خۆیتان هەمیشە و بەردەوام بەسەردا دەبارێنێت، هەروەها فریشتەکانیشی داوای لێخۆشبوونتان بۆ دەکەن، بۆ ئەوەی لە تاریکیەکان دەرتان بکات و بتانخاتە ناو نوورو ڕووناکیەوە، بەراستی ئەو پەروەردگارە هەمیشەو بەردەوام بۆ ئیمانداران میهرەبان و دڵۆڤانە.

تَحِيَّتُهُمْ يَوْمَ يَلْقَوْنَهُۥ سَلَٰمٌ ۚ وَأَعَدَّ لَهُمْ أَجْرًا كَرِيمًا ﴿٤٤﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِىُّ إِنَّآ أَرْسَلْنَٰكَ شَٰهِدًا وَمُبَشِّرًا وَنَذِيرًا ﴿٤٥﴾ وَدَاعِيًا إِلَى ٱللَّهِ بِإِذْنِهِۦ وَسِرَاجًا مُّنِيرًا ﴿٤٦﴾ وَبَشِّرِ ٱلْمُؤْمِنِينَ بِأَنَّ لَهُم مِّنَ ٱللَّهِ فَضْلًا كَبِيرًا ﴿٤٧﴾ وَلَا تُطِعِ ٱلْكَٰفِرِينَ وَٱلْمُنَٰفِقِينَ وَدَعْ أَذَىٰهُمْ وَتَوَكَّلْ عَلَى ٱللَّهِ ۚ وَكَفَىٰ بِٱللَّهِ وَكِيلًا ﴿٤٨﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ إِذَا نَكَحْتُمُ ٱلْمُؤْمِنَٰتِ ثُمَّ طَلَّقْتُمُوهُنَّ مِن قَبْلِ أَن تَمَسُّوهُنَّ فَمَا لَكُمْ عَلَيْهِنَّ مِنْ عِدَّةٍ تَعْتَدُّونَهَا ۖ فَمَتِّعُوهُنَّ وَسَرِّحُوهُنَّ سَرَاحًا جَمِيلًا ﴿٤٩﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِىُّ إِنَّآ أَحْلَلْنَا لَكَ أَزْوَٰجَكَ ٱلَّٰتِىٓ ءَاتَيْتَ أُجُورَهُنَّ وَمَا مَلَكَتْ يَمِينُكَ مِمَّآ أَفَآءَ ٱللَّهُ عَلَيْكَ وَبَنَاتِ عَمِّكَ وَبَنَاتِ عَمَّٰتِكَ وَبَنَاتِ خَالِكَ وَبَنَاتِ خَٰلَٰتِكَ ٱلَّٰتِى هَاجَرْنَ مَعَكَ وَٱمْرَأَةً مُّؤْمِنَةً إِن وَهَبَتْ نَفْسَهَا لِلنَّبِىِّ إِنْ أَرَادَ ٱلنَّبِىُّ أَن يَسْتَنكِحَهَا خَالِصَةً لَّكَ مِن دُونِ ٱلْمُؤْمِنِينَ ۗ قَدْ عَلِمْنَا مَا فَرَضْنَا عَلَيْهِمْ فِىٓ أَزْوَٰجِهِمْ وَمَا مَلَكَتْ أَيْمَٰنُهُمْ لِكَيْلَا يَكُونَ عَلَيْكَ حَرَجٌ ۗ وَكَانَ ٱللَّهُ غَفُورًا رَّحِيمًا ﴿٥٠﴾

(٤٤) ئەو رۆژەش کە بە دیداری خوا شاد دەبن، بە سەلامکردن پێشوازیتان لێدەکـات و پاداشتی زۆر بەنرخ و پیرۆزی بۆ ئامادە کردوون.

(٤٥) ئەی پێغەمبەر ﷺ ئێمـە بەراستی تۆمـان رەوانە کردووە کە شایەت بیت (بەسەر ئوممەتی ئیسلامەوە کە پەیامی خوات پـێ راگەیاندوون) و مـژدە بەخشیت (بـە ئیمـانداران بـەوەی رەزامەندی خـواو بەهەشتی بـەرین چاوەڕێیانـە) ترسێنەریشـیت (بێبـاوەڕان دەترسـێنیت لـە خەشم وقینی خوا و دۆزەخ)...

(٤٦) هـەروەها بـە مۆڵـەت و پشـتیوانی خـوا بانگەواز دەکەیت بۆ بەرنامە و ڕێبازی ئـەو زاتـە ، هەروەها چرایەکی روناککەرەوەی بـۆ سـەرجەم سەرگەردانان...

(٤٧) مژدەش بدە بە ئیمـانداران کـە بێگومـان، لەلایەن خواوە ڕێز و قەدرێکی زۆریان هەیە...

(٤٨) ملکـەچ و فەرمانبـەرداری کـافرو دووڕووەکـان مەبە، گـوێ مـەدە بـەو ئـازار و ناخۆشیانەی کە پێشی دەهێنـن بـۆ خـۆت و بانگەوازەکـەت، پشت بـە خـوا ببەسـتە، تەنـها خوایش بەسە کە پشتیوان و یاریدەدەربێت.

(٤٩) ئـەی ئـەو کەسـانەی باوەڕتـان هێنـاوە کاتێک ئافرەتانی ئیماندارتان مارە کرد، لەوەودوا جیابوونەوە و تـەڵاقتان دان پێش ئـەوەی بچنـە لایـان، ئـەوە هیـچ (عِدة)و ماوەیەکیان ناوێت تا حسابی بۆ بکەن(ماوەی چاوەڕوانی ناوێت بۆ ئەوەی شوو بکات بەکەسێکی تر)، لەگەڵ ئەوەشدا هەندێک دیاریان پێشکەش بکەن و بەجوانی دەستبەرداریان ببن.

(٥٠) ئەی پێغەمبەر ﷺ ئێمە بێگومان ئەو هاوسـەرانەتمان بـۆ حـەڵاڵ کردویت کـە مـارەییت پـێ بەخشیوون، ئـەو ئافرەتانەش کە کەنیزەکی تـۆن و لـە جـەنگدا بـەدیل گیراون (لـەو سـەردەمەدا کـەنیزەک دیاردەیـەکی کۆمەڵایـەتی سروشتی بووە، ئاینی پیرۆزی ئیسـلام بـە جۆرەهـا شێوە هـەوڵی نەهێشتنی ئەو دیاردەیـەی داوە)، هـەروەها کچـە مامەکانت، کچە پورەکانت، کچە خاڵەکانت، کچی ئەو پورانەت کە کۆچیان کرد لەگەڵ تۆداو هەر ئافرەتێکی بـڕوادار ئەگەر ویستی خۆی پێشکەشی پێغەمبەر بکات و پێغەمبەریش ویستی مـارەی بکـات، کـە ئەمـەیان تایبـەتی تۆیـە (ئەی پێغەمبـەر ﷺ) نـەک ئیمـانداران، بەراستی ئێمە ڕێ و شـوێنمان بـۆ ئـەوان (واتـە ئیمـانداران) روونکردۆتـەوە بەرامبـەر هاوسـەران وکەنیزەکـەکانیان ئـەم روونکردنەوەیـە بـۆ ئەوەیـە: هیـچ دڵـتەنگی و غـەمباریـەک داتنـەگرێت (وابزانیت کە تۆ لە سنوور دەرچویت) هەمیشە و بەردەوام خوا لێ خۆشبوو میهرەبانە .



تُرْجِي مَن تَشَاءُ مِنْهُنَّ وَتُؤْوِي إِلَيْكَ مَن تَشَاءُ ۖ وَمَنِ ابْتَغَيْتَ مِمَّنْ عَزَلْتَ فَلَا جُنَاحَ عَلَيْكَ ۚ ذَٰلِكَ أَدْنَىٰ أَن تَقَرَّ أَعْيُنُهُنَّ وَلَا يَحْزَنَّ وَيَرْضَيْنَ بِمَا آتَيْتَهُنَّ كُلُّهُنَّ ۚ وَاللَّهُ يَعْلَمُ مَا فِي قُلُوبِكُمْ ۚ وَكَانَ اللَّهُ عَلِيمًا حَلِيمًا ﴿٥١﴾ لَّا يَحِلُّ لَكَ النِّسَاءُ مِن بَعْدُ وَلَا أَن تَبَدَّلَ بِهِنَّ مِنْ أَزْوَاجٍ وَلَوْ أَعْجَبَكَ حُسْنُهُنَّ إِلَّا مَا مَلَكَتْ يَمِينُكَ ۗ وَكَانَ اللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ رَّقِيبًا ﴿٥٢﴾ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تَدْخُلُوا بُيُوتَ النَّبِيِّ إِلَّا أَن يُؤْذَنَ لَكُمْ إِلَىٰ طَعَامٍ غَيْرَ نَاظِرِينَ إِنَاهُ وَلَٰكِنْ إِذَا دُعِيتُمْ فَادْخُلُوا فَإِذَا طَعِمْتُمْ فَانتَشِرُوا وَلَا مُسْتَأْنِسِينَ لِحَدِيثٍ ۚ إِنَّ ذَٰلِكُمْ كَانَ يُؤْذِي النَّبِيَّ فَيَسْتَحْيِي مِنكُمْ ۖ وَاللَّهُ لَا يَسْتَحْيِي مِنَ الْحَقِّ ۚ وَإِذَا سَأَلْتُمُوهُنَّ مَتَاعًا فَاسْأَلُوهُنَّ مِن وَرَاءِ حِجَابٍ ۚ ذَٰلِكُمْ أَطْهَرُ لِقُلُوبِكُمْ وَقُلُوبِهِنَّ ۚ وَمَا كَانَ لَكُمْ أَن تُؤْذُوا رَسُولَ اللَّهِ وَلَا أَن تَنكِحُوا أَزْوَاجَهُ مِن بَعْدِهِ أَبَدًا ۚ إِنَّ ذَٰلِكُمْ كَانَ عِندَ اللَّهِ عَظِيمًا ﴿٥٣﴾ إِن تُبْدُوا شَيْئًا أَوْ تُخْفُوهُ فَإِنَّ اللَّهَ كَانَ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمًا ﴿٥٤﴾

(٥١) هەرکامێکیان کە بتەوێت دوای بخەیت (لە هاوسەرانت) یان هەر کامێکیان نزیک بکەیتەوە، ئەوەش کە داوای ئەکەیت لەوانەی کە وازت لێ هێناون، ئەوە هیچ گوناهێکت لەسەر نییە (چونکە تۆ ستەمکار نیت)، ئەو هێنانەوەیان نزیکترە بەوەی کە چاویان روون بێتەوە (خوای میهرەبان ئەم بارودۆخە خێزانییەی پێغەمبەر باس دەفەرموێت) تا خێزانەکانت دڵیان پێی ئارام بگرێت و هاوسەرانیش غەم وخەفەتیش نەخۆن و (وابزانن پێغەمبەر لێیان زویرە) هەمووانیش رازی بن بەوەی کە پێتداون، خوا خۆی دەزانێت چی لە دڵەکانتاندا حەشاردراوە، بێگومان هەمیشەو بەردەوام خوا زاناو دانایە.

(٥٢) لەمەودوا هێنانی ئافرەتانی تر بۆ تۆ حەڵاڵ نیە، یان وازهێنان لە هەندێکیان، تا هاوسەرانی تر بخەیتە جێیان، هەرچەندە ئەو ئافرەتانەی دەتەوێت بیانخەیتە جێگەی هاوسەرانت سەرسام بیت لە رێکو پێکیان جگە کەنیزەک، هەمیشە و بەردەوام خوا چاودێری هەموو شتێک دەکات.

(٥٣) ئەی ئەو کەسانەی باوەڕتان هێناوە مەچن بۆ سەردانی ماڵەکانی پێغەمبەر مەگەر مۆڵەتتان بدرێت و مۆڵەت بخوازن، ئەگەر مۆڵەت دران بۆ نان خواردنێک چاوەڕێی پێگەیشتنی مەکەن ئەگەر پێ نەگەیشتبوو (مەبەست ئەوەیە کە زوو مەچن کە هێشتا خواردنەکە پێ نەگەیشتووە)، بەڵام کاتێک بانگکران، ئەوە بچنە ژوورەوە، جا کاتێک نانتان خوارد بڵاوەی لێ بکەن و خۆتان بە گفتوگۆوە سەرگەرم مەکەن، چونکە بەراستی ئەو کارەتان پێغەمبەر ئازار دەدات، ئەویش شەرمتان لێ دەکات (داوای چوونە دەرەوەتان لێ ناکات)، خوایش شەرم لە راگەیاندنی حەق و رەوا ناکات، کاتێکیش داوای کەلوپەلێکتان لە خێزانەکانی پێغەمبەر کرد لە پشتی پەردەوە داوایان لێ بکەن، ئا ئەو جۆرە رەفتارە چاکتر و پاکترە بۆ دڵی ئێوە و ئەوانیش، بێگومان هیچ کات بۆتان نیە ئازار و دڵتەنگی بۆ پێغەمبەری خوا پێش بهێنن، هەرگیز بۆتان نیە هاوسەرانی دوای خۆی بەهیچ جۆرێک مارە بکەن، چونکە بێگومان ئەو کارەتان لای خوا زۆر گەورەیە (زۆر نابەجێیە، چونکە ئەوان دایکتانن، دایکیش لە کوری حەرامە).

(٥٤) ئەگەر شتێک دەربڕن و ئاشکرای بکەن یان بیشارنەوە و دەری نەبڕن، ئەوە بێگومان خوا بەهەموو شتێک ئاگا و زانایە (نهێنی و ئاشکرا لای ئەو زاتە چوونیەکە).

لَّا جُنَاحَ عَلَيْهِنَّ فِىٓ ءَابَآئِهِنَّ وَلَآ أَبْنَآئِهِنَّ وَلَآ إِخْوَٰنِهِنَّ وَلَآ أَبْنَآءِ إِخْوَٰنِهِنَّ وَلَآ أَبْنَآءِ أَخَوَٰتِهِنَّ وَلَا نِسَآئِهِنَّ وَلَا مَا مَلَكَتْ أَيْمَٰنُهُنَّ ۗ وَٱتَّقِينَ ٱللَّهَ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ شَهِيدًا ﴿٥٥﴾ إِنَّ ٱللَّهَ وَمَلَٰٓئِكَتَهُۥ يُصَلُّونَ عَلَى ٱلنَّبِىِّ ۚ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ صَلُّوا۟ عَلَيْهِ وَسَلِّمُوا۟ تَسْلِيمًا ﴿٥٦﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ يُؤْذُونَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ لَعَنَهُمُ ٱللَّهُ فِى ٱلدُّنْيَا وَٱلْءَاخِرَةِ وَأَعَدَّ لَهُمْ عَذَابًا مُّهِينًا ﴿٥٧﴾ وَٱلَّذِينَ يُؤْذُونَ ٱلْمُؤْمِنِينَ وَٱلْمُؤْمِنَٰتِ بِغَيْرِ مَا ٱكْتَسَبُوا۟ فَقَدِ ٱحْتَمَلُوا۟ بُهْتَٰنًا وَإِثْمًا مُّبِينًا ﴿٥٨﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِىُّ قُل لِّأَزْوَٰجِكَ وَبَنَاتِكَ وَنِسَآءِ ٱلْمُؤْمِنِينَ يُدْنِينَ عَلَيْهِنَّ مِن جَلَٰبِيبِهِنَّ ۚ ذَٰلِكَ أَدْنَىٰٓ أَن يُعْرَفْنَ فَلَا يُؤْذَيْنَ ۗ وَكَانَ ٱللَّهُ غَفُورًا رَّحِيمًا ﴿٥٩﴾ ۞ لَّئِن لَّمْ يَنتَهِ ٱلْمُنَٰفِقُونَ وَٱلَّذِينَ فِى قُلُوبِهِم مَّرَضٌ وَٱلْمُرْجِفُونَ فِى ٱلْمَدِينَةِ لَنُغْرِيَنَّكَ بِهِمْ ثُمَّ لَا يُجَاوِرُونَكَ فِيهَآ إِلَّا قَلِيلًا ﴿٦٠﴾ مَّلْعُونِينَ ۖ أَيْنَمَا ثُقِفُوٓا۟ أُخِذُوا۟ وَقُتِّلُوا۟ تَقْتِيلًا ﴿٦١﴾ سُنَّةَ ٱللَّهِ فِى ٱلَّذِينَ خَلَوْا۟ مِن قَبْلُ ۖ وَلَن تَجِدَ لِسُنَّةِ ٱللَّهِ تَبْدِيلًا ﴿٦٢﴾



(٥٥) هاوسەرانی پێغەمبەر ﷺ هیچ گوناهیان ناگات بێ پەردە گفتوگۆ بکەن لەگەڵ باو و باپیرانیان و کورەکانی خۆیان و براکانیان و برازاکانیان و خوشکەزاکانیان و ئەو ئافرەتانەیان (ئیشیان بۆ دەکەن لە ماڵدا)، یان ئەو کەسانەی بەندەن و لە ماڵەکانیاندا دەژین، لە خوا بترسن (ئەو سنوورانەی کە بۆی داناون مەیشکێنن)، بێگومان خوا شایەتە بەسەر هەمووشتێکەوە.

(٥٦) بەڕاستی خواو فریشتەکانی سڵاوات دەدەن لەسەر پێغەمبەر ﷺ، ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە، ئێوەش سەلام و سڵاواتی لەسەر بدەن و (بەردەوام یادی خێری بکەن).

(٥٧) بێگومان ئەوانەی ئازاری خواو پێغەمبەرەکەی دەدەن (مەبەست ئازاردانی پێغەمبەرە ﷺ یان ئەوانەی کە هاوەڵ بۆ خوا بڕیار دەدەن و کوفر دەکەن و جوێنی پێ دەدەن) خوا نەفرینی لێ کردون لە دنیا و قیامەتدا سزایەکی زۆر خەجاڵەت ئاوەرو سەرشۆڕکەریشی بۆ ئامادەکردوون.

(٥٨) ئەوانەش کە ئازاری پیاوانی ئیماندار و ئافرەتانی ئیماندار دەدەن بێ ئەوەی تاوانێکیان ئەنجامدابێت، ئەوە بەڕاستی ئەوانە بوختان و گوناهو تاوانێکی ئاشکرا دەگرنە ئەستۆ (بێگومان بەسەریانەوە ناچێت تۆڵەیان لێ دەسێنرێت).

(٥٩) ئەی پێغەمبەر ﷺ بە هاوسەرانت و کچەکانت و ئافرەتانی ئیماندار بڵێ: کە بە پۆشاکی بالاپۆش خۆیان داپۆشن ئەوە لەبارترین شتە کە پێی بناسرێن، تا ئازار نەدرێن و (تووشی گیروگرفت نەبن)، هەمیشە و بەردەوام خوا لێخۆشبوو میهرەبانە (لە کەمو کووڕی ڕابوردوتان خۆش دەبێت).

(٦٠) سوێند بەخوا ئەگەر دووڕووەکان و دڵ بیمارەکان و پڕو پاگەندەچیەکان لە مەدینەدا کۆڵ نەدەن، مۆڵەت و هانی تۆ دەدەین کە تۆڵەیان لێ بسێنیت و زۆربەیان دەربەدەر بکەیت و پاشان کەمێکیان نەبێت لە شاردا نەمێننەوە.

(٦١) ئەوانە نەفرین لێکراون لە هەر کوێیەکدا دەستکەوتن، ئەوە دەستگیر دەکرێن و دەکوژرێن (چونکە لە خراپە و پیلان و تاوان و کوشتن و دزی و درۆزنی زیاتر هیچیان لێ نەوەشاوەتەوە).

(٦٢) دژایەتی ئەو دووڕووانە لە بەرنامەی خوادایە و لە ڕابووردوشدا ئەنجامدراوە، هەرگیز گۆڕانکاری نابینی لە یاساو بەرنامەکانی خوادا.

يَسْـَٔلُكَ ٱلنَّاسُ عَنِ ٱلسَّاعَةِ قُلْ إِنَّمَا عِلْمُهَا عِندَ ٱللَّهِ وَمَا يُدْرِيكَ
لَعَلَّ ٱلسَّاعَةَ تَكُونُ قَرِيبًا ﴿٦٣﴾ إِنَّ ٱللَّهَ لَعَنَ ٱلْكَـٰفِرِينَ وَأَعَدَّ
لَهُمْ سَعِيرًا ﴿٦٤﴾ خَـٰلِدِينَ فِيهَآ أَبَدًا لَّا يَجِدُونَ وَلِيًّا وَلَا نَصِيرًا
﴿٦٥﴾ يَوْمَ تُقَلَّبُ وُجُوهُهُمْ فِى ٱلنَّارِ يَقُولُونَ يَـٰلَيْتَنَآ أَطَعْنَا ٱللَّهَ
وَأَطَعْنَا ٱلرَّسُولَا۠ ﴿٦٦﴾ وَقَالُوا۟ رَبَّنَآ إِنَّآ أَطَعْنَا سَادَتَنَا وَكُبَرَآءَنَا
فَأَضَلُّونَا ٱلسَّبِيلَا۠ ﴿٦٧﴾ رَبَّنَآ ءَاتِهِمْ ضِعْفَيْنِ مِنَ ٱلْعَذَابِ
وَٱلْعَنْهُمْ لَعْنًا كَبِيرًا ﴿٦٨﴾ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَا تَكُونُوا۟ كَٱلَّذِينَ
ءَاذَوْا۟ مُوسَىٰ فَبَرَّأَهُ ٱللَّهُ مِمَّا قَالُوا۟ ۚ وَكَانَ عِندَ ٱللَّهِ وَجِيهًا ﴿٦٩﴾
يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَقُولُوا۟ قَوْلًا سَدِيدًا ﴿٧٠﴾ يُصْلِحْ
لَكُمْ أَعْمَـٰلَكُمْ وَيَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ ۗ وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ
فَقَدْ فَازَ فَوْزًا عَظِيمًا ﴿٧١﴾ إِنَّا عَرَضْنَا ٱلْأَمَانَةَ عَلَى ٱلسَّمَـٰوَٰتِ
وَٱلْأَرْضِ وَٱلْجِبَالِ فَأَبَيْنَ أَن يَحْمِلْنَهَا وَأَشْفَقْنَ مِنْهَا وَحَمَلَهَا
ٱلْإِنسَـٰنُ ۖ إِنَّهُۥ كَانَ ظَلُومًا جَهُولًا ﴿٧٢﴾ لِّيُعَذِّبَ ٱللَّهُ ٱلْمُنَـٰفِقِينَ
وَٱلْمُنَـٰفِقَـٰتِ وَٱلْمُشْرِكِينَ وَٱلْمُشْرِكَـٰتِ وَيَتُوبَ ٱللَّهُ
عَلَى ٱلْمُؤْمِنِينَ وَٱلْمُؤْمِنَـٰتِ ۗ وَكَانَ ٱللَّهُ غَفُورًا رَّحِيمًۢا ﴿٧٣﴾

(٦٣) ئەی پێغەمبەر ﷺ خەڵكی پرسیارت لێ دەكەن دەربارەی كاتی بەرپا بوونی ڕۆژی قیامەت، پێیان بڵێ: بێگومان زانینەكەی هەر لای خوایە، جا چی تۆی ئاگادار كردووە لەوانەیە ڕۆژی قیامەت زۆر نزیكیش بێت (خەڵكیش لێی غافڵن).

(٦٤) بێگومان ئەو خوایە نەفرینی كردووە لە كافرەكان، لە ڕۆژی قیامەتیشدا سزایەكی زۆر سەختی بۆ ئامادە كردوون...

(٦٥) كە بۆ هەمیشە تیایدا دەبێ بژین، لەوێش نە پشتیوانێك شك دەبەن فریایان بكەوێت، نە كەسێك ڕزگاریان بكات.

(٦٦) ڕۆژێك دێت ڕووخساریان ئەم دیودیوی پێ دەكرێت لەناو ئاگردا (تا چاك ببرژێن و بسوتێن) بەدەم ئاهو ناڵەوە دەڵێن: ئای خۆزگە فەرمانبەرداری خوا بووینایە، گوێڕایەڵی پێغەمبەر بووینایە.

(٦٧) هەروەها دەڵێن: پەروەردگارا بەڕاستی ئێمە ملكەچ و فەرمانبەرداری ئاغاو گەورەكانمان بووین، هەر ئەوان ڕێگە و ڕێبازی ڕاستیان لە ئێمە شێوان و سەرگەردانیان كردین.

(٦٨) پەروەردگارا: دوو بەرابەر و دوو چەندانە سزای ئەوانە بدە و نەفرینێكی گەورە و زۆر بێ ئەندازەیان لێ بكە.

(٦٩) ئەی ئەو كەسانەی باوەڕتان هێناوە: وەكو ئەوانە مەبن كە ئازاری موسایاندا، خوای گەورەش لەو تۆمەت و بوختانەیان پاراستی و پاكی ئاشكرا كرد، ئەو لای خوا زۆر بەڕێز و ئازیزە.

(٧٠) ئەی ئەوكەسانەی باوەڕتان هێناوە لە خوا بترسن و پارێزكار بن، هەمیشە قسەی بەجێ و بەسوود بكەن.

(٧١) ئەوسا ئیتر كردەوەكانتان چاك و بەجێ و پەسەند دەكات، لە گوناهەكانیشتان خۆش دەبێت، جا ئەوەی فەرمانبەرداری خواو پێغەمبەرەكەی بێت، ئەوە بەڕاستی سەركەوتن و سەرفەرازیەكی بێ ئەندازە و بێ سنووری بەدەستهێناوە.

(٧٢) بێگومان ئێمە ئەم ئەمانەتەمان (ئەمانەتی قورئان) نیشانی ئاسمانەكان و زەوی و كێوەكاندا، (یاخود پێشنیارمان كرد ئێوە ئەم ئەمانەتە بگرنە ئەستۆ)، بەڵام هەمووان دەستیان پێوە ناو ترسان لێی (پێیان چاك بوو هەر فەرمانبەرداربن، سەرپشك نەبن) كەچی ئادەمیزاد هەڵیگرت و گرتیە ئەستۆی خۆی، بەڕاستی زۆر ستەمكار و نەفام بوو (ئەگەر زۆرینە ڕەچاو بكەین)...

(٧٣) تا خوا سزای پیاوان و ئافرەتانی دووڕوو و هاوەڵگەران لە پیاوان و ئافرەتان بدات، هەروەها تەوبە و پەشیمانی لە پیاوان و ئافرەتانی ئیماندار وەربگرێت، بێگومان خوای گەورە بۆ ئیمانداران لێخۆشبوو و میهرەبانە.

سُورَةُ سَبَإ

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ ٱلَّذِى لَهُۥ مَا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِى ٱلْأَرْضِ وَلَهُ ٱلْحَمْدُ فِى ٱلْءَاخِرَةِ ۚ وَهُوَ ٱلْحَكِيمُ ٱلْخَبِيرُ ﴿١﴾ يَعْلَمُ مَا يَلِجُ فِى ٱلْأَرْضِ وَمَا يَخْرُجُ مِنْهَا وَمَا يَنزِلُ مِنَ ٱلسَّمَآءِ وَمَا يَعْرُجُ فِيهَا ۚ وَهُوَ ٱلرَّحِيمُ ٱلْغَفُورُ ﴿٢﴾ وَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ لَا تَأْتِينَا ٱلسَّاعَةُ ۖ قُلْ بَلَىٰ وَرَبِّى لَتَأْتِيَنَّكُمْ عَٰلِمِ ٱلْغَيْبِ ۖ لَا يَعْزُبُ عَنْهُ مِثْقَالُ ذَرَّةٍ فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَلَا فِى ٱلْأَرْضِ وَلَآ أَصْغَرُ مِن ذَٰلِكَ وَلَآ أَكْبَرُ إِلَّا فِى كِتَٰبٍ مُّبِينٍ ﴿٣﴾ لِّيَجْزِىَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ ۚ أُو۟لَٰٓئِكَ لَهُم مَّغْفِرَةٌ وَرِزْقٌ كَرِيمٌ ﴿٤﴾ وَٱلَّذِينَ سَعَوْ فِىٓ ءَايَٰتِنَا مُعَٰجِزِينَ أُو۟لَٰٓئِكَ لَهُمْ عَذَابٌ مِّن رِّجْزٍ أَلِيمٌ ﴿٥﴾ وَيَرَى ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْعِلْمَ ٱلَّذِىٓ أُنزِلَ إِلَيْكَ مِن رَّبِّكَ هُوَ ٱلْحَقَّ وَيَهْدِىٓ إِلَىٰ صِرَٰطِ ٱلْعَزِيزِ ٱلْحَمِيدِ ﴿٦﴾ وَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ هَلْ نَدُلُّكُمْ عَلَىٰ رَجُلٍ يُنَبِّئُكُمْ إِذَا مُزِّقْتُمْ كُلَّ مُمَزَّقٍ إِنَّكُمْ لَفِى خَلْقٍ جَدِيدٍ ﴿٧﴾

## سوورەتی (سبـــأ)

بەناوی خوای بەخشندە و میهرەبان

(١) سوپاس و ستایش بۆ ئەو خوایەی کە هەرچی لە ئاسمانەکان و زەویدا هەیە هەمووی ئەو خاوەنێتی، ستایش و سوپاس لە قیامەتیشدا هەر پێشکەش بەو دەکرێت، ئەو خوایەش دانا و ئاگایە.

(٢) ئەوزاتە دەزانێت چی دەچێت بەناخی زەویدا و چیشی لێ دێتە دەرەوە، چی لە ئاسمان دێتە خوارەوە و چیش پیایدا بەرزدەبێتەوە، بەراستی ئەو خوایە میهرەبان و لێخۆش بووە (بە نیسبەت ئیمانداران و تەوبەکارانەوە).

(٣) ئەوانەی کافرو خوانەناسن دەیانوت: قیامەت هەر نایەت و نامانگاتێ، ئەی پێغەمبەر ﷺ پێیان بڵێ: نەخێر وانیە، سوێند بە پەروەردگارم هەر یەختان دەگرێت چونکە ئەو زاتە زانایە بەنهێنی و شاراوەکان ( چاک دەزانێت کەی بەرپای دەکات)، ئەندازەی کێشی گەردیلەیەک لە ئاسمانەکان و زەویدا لە خوا وون نابێت، هەروەها لەویش بچوکتر یان گەورەتر نی‌یە کە لە کتێبی تایبەتی روون و ئاشکرادا، لە ـ لوح المحفوظ ـ دا تۆمارە نەکرابێت .

(٤) ئەمەش بۆ ئەوەی پاداشتی ئەوانە بداتەوە کە باوەڕیان هێناوە و کردەوە چاکەکانیان ئەنجام داوە، ئا ئەوانە لێخۆشبوون و رزق و رۆزی ناسک و نازدار (لە بەهەشتی بەریندا) بۆیان ئامادەیە.

(٥) ئەوانەش کە هەوڵ و کۆششیان داوە تا بەربەست دروست بکەن لە رێگەی پەیامی ئێمەدا، وا دەزانن لە سزای ئێمە رزگاریان دەبێت، ئەوانە سزاو تۆڵەیەکی زۆر بە سۆو پڕ ئازاریان بۆ ئامادەیە.

(٦) ئەوانەی زانستی و زانیاریان پێدراوە(چ زانستی ئاینی، وەک گاورو جوو، یان ئەوانەی رۆدەچن لە زانستە مادیەکاندا) چاک دەزانن ئەوەی لەلایەن پەروەردگارتەوە بۆت رەوانەکراوە هەرئەوە حەق و راستە، هیدایەت و رێنموویی بەخشە بۆ رێبازی پەروەردگاری خاوەن دەسەڵات و شایستەی سوپاس و ستایش.

(٧) بێبڕواکان (بەگاڵتە پێکردنەوە) دەیانوت: ئایا پیاوێکتان پێ بناسێنین کە هەواڵتان بداتێ، کە کاتێک پارچە پارچە بوون و هەلا هەلا بوون لە توێی خاکدا، ئێوە بێگومان دووبارە سەرلەنوێ دروست دەکرێنەوە؟!.

أَفۡتَرَىٰ عَلَى ٱللَّهِ كَذِبًا أَم بِهِۦ جِنَّةُۢۗ بَلِ ٱلَّذِينَ لَا يُؤۡمِنُونَ بِٱلۡأٓخِرَةِ فِي ٱلۡعَذَابِ وَٱلضَّلَٰلِ ٱلۡبَعِيدِ ﴿٨﴾ أَفَلَمۡ يَرَوۡاْ إِلَىٰ مَا بَيۡنَ أَيۡدِيهِمۡ وَمَا خَلۡفَهُم مِّنَ ٱلسَّمَآءِ وَٱلۡأَرۡضِۚ إِن نَّشَأۡ نَخۡسِفۡ بِهِمُ ٱلۡأَرۡضَ أَوۡ نُسۡقِطۡ عَلَيۡهِمۡ كِسَفٗا مِّنَ ٱلسَّمَآءِۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَةٗ لِّكُلِّ عَبۡدٖ مُّنِيبٖ ﴿٩﴾ ۞ وَلَقَدۡ ءَاتَيۡنَا دَاوُۥدَ مِنَّا فَضۡلٗاۖ يَٰجِبَالُ أَوِّبِي مَعَهُۥ وَٱلطَّيۡرَۖ وَأَلَنَّا لَهُ ٱلۡحَدِيدَ ﴿١٠﴾ أَنِ ٱعۡمَلۡ سَٰبِغَٰتٖ وَقَدِّرۡ فِي ٱلسَّرۡدِۖ وَٱعۡمَلُواْ صَٰلِحًاۖ إِنِّي بِمَا تَعۡمَلُونَ بَصِيرٞ ﴿١١﴾ وَلِسُلَيۡمَٰنَ ٱلرِّيحَ غُدُوُّهَا شَهۡرٞ وَرَوَاحُهَا شَهۡرٞۖ وَأَسَلۡنَا لَهُۥ عَيۡنَ ٱلۡقِطۡرِۖ وَمِنَ ٱلۡجِنِّ مَن يَعۡمَلُ بَيۡنَ يَدَيۡهِ بِإِذۡنِ رَبِّهِۦۖ وَمَن يَزِغۡ مِنۡهُمۡ عَنۡ أَمۡرِنَا نُذِقۡهُ مِنۡ عَذَابِ ٱلسَّعِيرِ ﴿١٢﴾ يَعۡمَلُونَ لَهُۥ مَا يَشَآءُ مِن مَّحَٰرِيبَ وَتَمَٰثِيلَ وَجِفَانٖ كَٱلۡجَوَابِ وَقُدُورٖ رَّاسِيَٰتٍۚ ٱعۡمَلُوٓاْ ءَالَ دَاوُۥدَ شُكۡرٗاۚ وَقَلِيلٞ مِّنۡ عِبَادِيَ ٱلشَّكُورُ ﴿١٣﴾ فَلَمَّا قَضَيۡنَا عَلَيۡهِ ٱلۡمَوۡتَ مَا دَلَّهُمۡ عَلَىٰ مَوۡتِهِۦٓ إِلَّا دَآبَّةُ ٱلۡأَرۡضِ تَأۡكُلُ مِنسَأَتَهُۥۖ فَلَمَّا خَرَّ تَبَيَّنَتِ ٱلۡجِنُّ أَن لَّوۡ كَانُواْ يَعۡلَمُونَ ٱلۡغَيۡبَ مَا لَبِثُواْ فِي ٱلۡعَذَابِ ٱلۡمُهِينِ ﴿١٤﴾



(٨) ئایا ئەو درۆی بەدەم خواوە هەڵبەستووە، یان شێتی سەری لێداوە ؟! نەخێر، وانییە، بەڵکو ئەوانەی کە باوەڕ بەرۆژی دوایی ناهێنن، لە سزاو سەرگەردانیەکی زۆر دووردان.

(٩) جا ئایا ئەوانە سەرنجی دەوروبەری خۆیان نەداوە، چی دەورەی داون لە ئاسمان و زەویدا ؟! ، سەرنجی بەردەمیان نەداوە ؟!، ئاوڕێک لە دواوە نادەنەوە ؟! ، ئەگەر بمانەوێت بە ناخی زەویدا دەیانبەینە خوارەوە، یان پارچەیەک لە ئاسمانەوە بەسەریاندا بەر دەدەینەوە، بەڕاستی تا لەو توانا و دەسەڵاتداریەدا نیشانەی روون و ئاشکرا هەیە، بۆ هەر بەندەیەک کە گەڕابێتەوە بۆ لای خوا و هۆشی لای ڕەزامەندیی ئەو بێت.

(١٠) سوێند بەخوا بەڕاستی ئێمە رێزو بایەخێکی زۆرمان بەخشی بە داود لەلایەن خۆمانەوە، (فەرمانمان داوە): ئەی کێوەکان و باڵندەکان تەسبیحات و سروودی ستایشی لەگەڵدا بڵێنەوە، هەروەها ئاسنیشمان بۆ نەرم کرد (وەکو موعجیزەیەک ، تا پێداویستیەکانی بەئاسانی لێ دروست بکات)...

(١١) هەروەها فەرمانمان پێدا کە: چەندەها کەلوپەلی جەنگیی فراوان دروست بکە، ئەڵقە و تەنینەکانیشی بە رێکوپێکی رێک بخە و لە یەکیان تێهەڵکێش بکە، هەروەها فەرمانمان پێدان: کارو کردەوەی چاکە ئەنجام بدەن، دڵنیاش بن کە من بینام بەو کارو کردەوانەی کە دەیکەن.

(١٢) بۆ سولەیمانیش ـ با ـ مان خستە ژێر فەرمانیەوە، بەیانیان یەک مانگە رێ دەهاتەوە، کانی ـ مس ـ یشمان بۆ تواندەوە، لە پەریەکانیش هەندێکمان بۆ راهێنا کە لەبەر دەستیدا کار بکەن بەفەرمانی پەروەردگاری، جا ئەوەی لە فەرمانی ئێمە دەربچێت سزای دۆزەخی پێ دەچێژین.

(١٣) سولەیمان هەرچی بویستایە، پەریەکان بۆیان دروست دەکرد، لە چەندەها جۆری میحراب و شوێنی خواپەرستی، لە پەیکەرو قاپ و کاسە وەک حەوزی فراوان، هەروەها مەنجەڵی گەورەی وا کە لە جێگەی خۆی دامەزراوە و ناجولێت، ئینجا پێمان وتن: ئەی نەوە و شوێنکەوتوانی داود، ئێوە بەکردارو گوفتار سوپاسگوزار بن (چاکە لەگەڵ خەڵکیدا بکەن)، هەرچەندە کەمێک لە بەندەکانم زۆر سوپاسگوزارن.

(١٤) کاتێک بڕیاری مردنی سولەیمانمان داو مرد، تەنها مۆرانە نەبێت کە گۆچانەکەی کلۆر دەکرد، هیچ شتێک ئەوانی ئاگادار نەکرد لەمردنەکەی، جا کە سولەیمان کەوت بە رووداد، ئەوسا پەریەکان زانیان سولەیمان دەمێکە وەفاتی کردووە، جا ئەگەر غەیب زان و نهێنی زان بوونایە، ئاوا لە کارو فرمانی ناخۆش و ریسواکەردا بەردەوام نەدەبوون (چونکە لە ترسدا لەکاری سەختدا بەردەوام بوون و نەیانزانی مردووە).

لَقَدْ كَانَ لِسَبَإٍ فِي مَسْكَنِهِمْ ءَايَةٌ جَنَّتَانِ عَن يَمِينٍ وَشِمَالٍ كُلُوا مِن رِّزْقِ رَبِّكُمْ وَاشْكُرُوا لَهُ بَلْدَةٌ طَيِّبَةٌ وَرَبٌّ غَفُورٌ ﴿١٥﴾ فَأَعْرَضُوا فَأَرْسَلْنَا عَلَيْهِمْ سَيْلَ الْعَرِمِ وَبَدَّلْنَاهُم بِجَنَّتَيْهِمْ جَنَّتَيْنِ ذَوَاتَيْ أُكُلٍ خَمْطٍ وَأَثْلٍ وَشَيْءٍ مِّن سِدْرٍ قَلِيلٍ ﴿١٦﴾ ذَٰلِكَ جَزَيْنَاهُم بِمَا كَفَرُوا وَهَلْ نُجَازِي إِلَّا الْكَفُورَ ﴿١٧﴾ وَجَعَلْنَا بَيْنَهُمْ وَبَيْنَ الْقُرَى الَّتِي بَارَكْنَا فِيهَا قُرًى ظَاهِرَةً وَقَدَّرْنَا فِيهَا السَّيْرَ سِيرُوا فِيهَا لَيَالِيَ وَأَيَّامًا آمِنِينَ ﴿١٨﴾ فَقَالُوا رَبَّنَا بَاعِدْ بَيْنَ أَسْفَارِنَا وَظَلَمُوا أَنفُسَهُمْ فَجَعَلْنَاهُمْ أَحَادِيثَ وَمَزَّقْنَاهُمْ كُلَّ مُمَزَّقٍ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَاتٍ لِّكُلِّ صَبَّارٍ شَكُورٍ ﴿١٩﴾ وَلَقَدْ صَدَّقَ عَلَيْهِمْ إِبْلِيسُ ظَنَّهُ فَاتَّبَعُوهُ إِلَّا فَرِيقًا مِّنَ الْمُؤْمِنِينَ ﴿٢٠﴾ وَمَا كَانَ لَهُ عَلَيْهِم مِّن سُلْطَانٍ إِلَّا لِنَعْلَمَ مَن يُؤْمِنُ بِالْآخِرَةِ مِمَّنْ هُوَ مِنْهَا فِي شَكٍّ وَرَبُّكَ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ حَفِيظٌ ﴿٢١﴾ قُلِ ادْعُوا الَّذِينَ زَعَمْتُم مِّن دُونِ اللَّهِ لَا يَمْلِكُونَ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ فِي السَّمَاوَاتِ وَلَا فِي الْأَرْضِ وَمَا لَهُمْ فِيهِمَا مِن شِرْكٍ وَمَا لَهُ مِنْهُم مِّن ظَهِيرٍ ﴿٢٢﴾

(١٥) سوێند بەخوا بەڕاستی بۆ خەڵکی سەبەء لە وڵاتی خۆیاندا بەڵگە و نیشانەی دەسەڵاتی خوا ئاشکرایە، کە ئەویش دوو باخی زۆرگەورە بوو لە لای ڕاست و چەپی ناوچەکەدا، فەرمانیان پێ درابووکە: بخۆن لە رزق و ڕۆزی پەروەردگارتان و سوپاسگوزاری بن، وڵاتێکی خۆش و ئاوەدان، پەروەردگارێکی لێخۆشبوو و لێبووردە...

(١٦) جا ئەوان لەباتی شوکرانە بژێری و خواپەرستی پشتیان هەڵکرد و بەدەم بانگەوازی خواوە نەچوون، بەهۆی ئەوەوە ئێمەش لافاوێکی وێرانکەرمان بەسەردا بەڕەڵا کردن، (کە باخ و بێستانی کاول کردن) ئەوسا لە جیاتی ئەو دووباخە گەورەیە دووباخی دڕکاوی بەرو بووم تاڵ و درەختی بێ بەری وەک دارگەزۆ کەمێک درەختی (سدر) یش کە بەرو بوومێکی کەمی هەیە، پێمان بەخشین.

(١٧) ئا بەو جۆرە سەختە تۆڵەمان لێسەندن بەهۆی ئەوەوە کە بێ باوەڕو سپڵە بوون، ئایا ئێمە تۆڵە هەر لە کافرو سپڵە ئاسێنین؟!

(١٨) ئەوسا ئێمە لە نێوان ئەمان و ئەو شوێنانەدا کە بەرەکەتمان بەسەردا ڕژاندبوون دێهات و ئاوەدانی ئاشکرامان بەرپا کردبوو، کە بەبێ ماندوو بوون ئەوان سەفەریان دەکرد (لە نێوان شام و یەمەندا) ماوەی نێوان دێهاتەکانیان دەبڕی بە ئاسانی و بێ ماندوو بوون و (پێمان وتبوون، دە سەفەرو بازرگانی بکەن)، بڕۆن چەندەها شەو و ڕۆژ بێ ئەوەی هیچ ترس و بیمتان هەبێت.

(١٩) کەچی (لەو ناز و نیعمەتەش بێزاربوون و) وتیان: پەروەردگارا نێوانی ڕێگەی سەفەرەکانمان لەیەک دوور بخەرەوە، بێگومان بەم داخوازیەیان ستەمیان لە خۆیان کرد، ئێمەش کردمانن بە داستان و باسی سەرزاری خەڵکی و پارچە پارچەمان کردن زۆر بەخراپی، بەڕاستی ئا لەو ڕووداو و حاڵەتانەدا بەڵگە و نیشانەی زۆر هەیە بۆ کەسانێک زۆر خۆگربن لە کاتی ناخۆشی و تەنگانەدا و سوپاسگوزاربن لەکاتی خۆشیدا (هەوڵ بدەن وەکو ئەو قەومە ناڵەبارە بیانووگرە نەبن).

(٢٠) لەڕاستیدا گومانی شەیتان بەڕاست دەرچوو بەرامبەر ئەو جۆرە کەسانە (کە ڕوو بە پەروەردگار کاتی خۆی وتبووی: دەبینیت زۆربەی خەڵکی سوپاسگوزار نابن) کەچی خەڵکی بێ پەروا هەرشوێنی کەوتن، جگە لە دەستەیەک لە بڕواداران.

(٢١) جا وەنەبێت ئیبلیس هیچ دەسەڵاتێکی بەسەریاندا ببێت، بەڵکو ئێمە ویستومانە ڕوون بێت و دەربکەوێت، کێ باوەڕی بە قیامەت و ڕۆژی دوایی هەیە و کێش لە شک وگوماندایە، (دڵنیابە ئەی پێغەمبەر) کە پەروەردگاری تۆ ئاگادار و چاودێرە بەسەر هەموو شتێکدا و هیچ شتێکی لێ بزر نابێت.

(٢٢) ئەی پێغەمبەر ﷺ بەهاوەڵگەران بڵێ: هەر هاناو هاوار ببەن بۆ ئەوانەی کە لە جیاتی خوا دەیانپەرستن!! چونکە ئەوانە خاوەنی بچوکتر لە گەردیلەیەک نین نە لە ئاسمانەکان، نە لە زەویدا و هیچ هاوبەشی و هاوکاریەکیشیان نیە تیایاندا، دەسەڵاتی هیچ پشتیوانی و یارمەتیەکیشیان نیە.



وَلَا تَنفَعُ ٱلشَّفَٰعَةُ عِندَهُۥٓ إِلَّا لِمَنْ أَذِنَ لَهُۥ ۚ حَتَّىٰٓ إِذَا فُزِّعَ عَن قُلُوبِهِمْ قَالُوا۟ مَاذَا قَالَ رَبُّكُمْ ۖ قَالُوا۟ ٱلْحَقَّ ۖ وَهُوَ ٱلْعَلِىُّ ٱلْكَبِيرُ ﴿٢٣﴾ ۞ قُلْ مَن يَرْزُقُكُم مِّنَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۖ قُلِ ٱللَّهُ ۖ وَإِنَّآ أَوْ إِيَّاكُمْ لَعَلَىٰ هُدًى أَوْ فِى ضَلَٰلٍ مُّبِينٍ ﴿٢٤﴾ قُل لَّا تُسْـَٔلُونَ عَمَّآ أَجْرَمْنَا وَلَا نُسْـَٔلُ عَمَّا تَعْمَلُونَ ﴿٢٥﴾ قُلْ يَجْمَعُ بَيْنَنَا رَبُّنَا ثُمَّ يَفْتَحُ بَيْنَنَا بِٱلْحَقِّ وَهُوَ ٱلْفَتَّاحُ ٱلْعَلِيمُ ﴿٢٦﴾ قُلْ أَرُونِىَ ٱلَّذِينَ أَلْحَقْتُم بِهِۦ شُرَكَآءَ ۖ كَلَّا ۚ بَلْ هُوَ ٱللَّهُ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ ﴿٢٧﴾ وَمَآ أَرْسَلْنَٰكَ إِلَّا كَآفَّةً لِّلنَّاسِ بَشِيرًا وَنَذِيرًا وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٢٨﴾ وَيَقُولُونَ مَتَىٰ هَٰذَا ٱلْوَعْدُ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ ﴿٢٩﴾ قُل لَّكُم مِّيعَادُ يَوْمٍ لَّا تَسْتَـْٔخِرُونَ عَنْهُ سَاعَةً وَلَا تَسْتَقْدِمُونَ ﴿٣٠﴾ وَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ لَن نُّؤْمِنَ بِهَٰذَا ٱلْقُرْءَانِ وَلَا بِٱلَّذِى بَيْنَ يَدَيْهِ ۗ وَلَوْ تَرَىٰٓ إِذِ ٱلظَّٰلِمُونَ مَوْقُوفُونَ عِندَ رَبِّهِمْ يَرْجِعُ بَعْضُهُمْ إِلَىٰ بَعْضٍ ٱلْقَوْلَ يَقُولُ ٱلَّذِينَ ٱسْتُضْعِفُوا۟ لِلَّذِينَ ٱسْتَكْبَرُوا۟ لَوْلَآ أَنتُمْ لَكُنَّا مُؤْمِنِينَ ﴿٣١﴾

(٢٣) هیچ تکایەکیش سوودی نیە لای خوا مەگەر بۆ کەسێک خوا مۆڵەتی دابێت، هەتا ئەو کاتەی کە ترس لە دڵی هەموویان لاچوو و هۆشیان پێدا هاتەوە، لە یەکتر دەپرسن: پەروەردگارتان فەرمانی بەچی داو چی فەرموو، لە وەڵامدا دەڵێن: حەق و راست و دروستی فەرموو، هەر ئەویش بەرزو بڵند و گەورەیە.

(٢٤) ئەی پێغەمبەر ﷺ بە هاوەڵگەران بڵێ: کێ رزق و رۆزیتان پێ دەبەخشێت لە ئاسمانەکان و زەویەوە (ئەگەر بەهۆی سپڵەییانەوە وەڵامیان نەدایتەوە تۆ) بڵێ: مەگەر هەر زاتی ـ اللـه ـ رۆزی بەخش نیە، ئەوسا پێیان بڵێ: بێگومان ئێمە، یان ئێوە لەسەر رێگەی راست و دروستی هیدایەتین، یاخود لە گومڕاییەکی ئاشکرادا رۆچوین!! (خۆتان ببنە داوەر و حەکەم)

(٢٥) هەروەها پێیان بڵێ: ئێوە پرسیارتان لێ ناکرێت دەربارەی ئەو گوناهانەی کردومانە، ئێمەش پرسیارمان لێناکرێت دەربارەی ئەو کارو کردەوانەتان کە ئەنجامی دەدەن (هەرکەس بەرپرسی کارو کردەوە و بیروباوەڕی خۆیەتی).

(٢٦) پێیان بڵێ: رۆژێک دێت پەروەردگارمان هەموو لایەکمان کۆدەکاتەوە، لەوەودوا لەسەر بنچینەی حەق و راستی جیامان دەکاتەوە، (باوەڕداران بۆ بەهەشت و بەختەوەری، کافر و هاوەڵگەران بۆ دۆزەخ و دەردی سەری)، جا بێگومان لەو رۆژەدا ئەو زاتە هەر خۆی سەردار و باڵادەستە و زانای بێ سنوورە.

(٢٧) دووبارە پێیان بڵێ: ئادەی ئەوانەم نیشان بدەن کە دابوتانە پاڵ خواو بەهاوبەشی ئەوتان دادەنا، نەخێر هاوەڵ و هاوبەشی نییە، وازبهێنن لەو بیروباوەڕە، بەڵکو هەر ئەو زاتە خوایە کە باڵادەست و دانایە.

(٢٨) ئێمە تەنها بۆ هەموو خەڵکی نەبێت، تۆمان رەوانە نەکردووە، لەکاتێکدا مژدەدەرو ترسێنەریت بۆیان، بەڵام زۆربەی خەڵکی بەم راستییە نازانن...

(٢٩) بۆیە کافران دەڵێن: باشە؛ کەی ئەم بەڵێنی زیندوو بوونەوەیە دێتە دی ئەگەر ئێوە راستگۆن...

(٣٠) پێیان بڵێ: بەڵێنی رۆژێکتان پێدراوە کە ناتوانن داوای تاوێک دواکەوتن یان پێشکەوتنی بکەن.

(٣١) ئەوانەی بێ باوەڕ بوون وتیان: هەرگیز باوەڕ بەم قورئانەو بەو هەواڵەش ناکەین کە باسی دەکات (کە قیامەتە)، خۆ ئەگەر دەبینیت کاتێک ستەمکاران وەستێنراون لەبەردەم دادگای پەروەردگاریاندا قسە دەڵێن بەیەکترو یەکتری تاوانبار دەکەن، لاوازکراوەکان بەزۆردارو دەسەڵاتدارەکان دەڵێن: ئەگەر ئێوە نەبوونایەتە کۆسپ، ئەوە ئێمە باوەڕدار دەبووین.

قَالَ ٱلَّذِينَ ٱسْتَكْبَرُوا۟ لِلَّذِينَ ٱسْتُضْعِفُوٓا۟ أَنَحْنُ صَدَدْنَٰكُمْ
عَنِ ٱلْهُدَىٰ بَعْدَ إِذْ جَآءَكُم ۖ بَلْ كُنتُم مُّجْرِمِينَ ﴿٣٢﴾ وَقَالَ ٱلَّذِينَ
ٱسْتُضْعِفُوا۟ لِلَّذِينَ ٱسْتَكْبَرُوا۟ بَلْ مَكْرُ ٱلَّيْلِ وَٱلنَّهَارِ إِذْ
تَأْمُرُونَنَآ أَن نَّكْفُرَ بِٱللَّهِ وَنَجْعَلَ لَهُۥٓ أَندَادًا ۚ وَأَسَرُّوا۟ ٱلنَّدَامَةَ
لَمَّا رَأَوُا۟ ٱلْعَذَابَ وَجَعَلْنَا ٱلْأَغْلَٰلَ فِىٓ أَعْنَاقِ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ ۚ
هَلْ يُجْزَوْنَ إِلَّا مَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴿٣٣﴾ وَمَآ أَرْسَلْنَا فِى قَرْيَةٍ
مِّن نَّذِيرٍ إِلَّا قَالَ مُتْرَفُوهَآ إِنَّا بِمَآ أُرْسِلْتُم بِهِۦ كَٰفِرُونَ ﴿٣٤﴾
وَقَالُوا۟ نَحْنُ أَكْثَرُ أَمْوَٰلًا وَأَوْلَٰدًا وَمَا نَحْنُ بِمُعَذَّبِينَ ﴿٣٥﴾
قُلْ إِنَّ رَبِّى يَبْسُطُ ٱلرِّزْقَ لِمَن يَشَآءُ وَيَقْدِرُ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ ٱلنَّاسِ
لَا يَعْلَمُونَ ﴿٣٦﴾ وَمَآ أَمْوَٰلُكُمْ وَلَآ أَوْلَٰدُكُم بِٱلَّتِى تُقَرِّبُكُمْ عِندَنَا
زُلْفَىٰٓ إِلَّا مَنْ ءَامَنَ وَعَمِلَ صَٰلِحًا فَأُو۟لَٰٓئِكَ لَهُمْ جَزَآءُ ٱلضِّعْفِ
بِمَا عَمِلُوا۟ وَهُمْ فِى ٱلْغُرُفَٰتِ ءَامِنُونَ ﴿٣٧﴾ وَٱلَّذِينَ يَسْعَوْنَ فِىٓ
ءَايَٰتِنَا مُعَٰجِزِينَ أُو۟لَٰٓئِكَ فِى ٱلْعَذَابِ مُحْضَرُونَ ﴿٣٨﴾ قُلْ
إِنَّ رَبِّى يَبْسُطُ ٱلرِّزْقَ لِمَن يَشَآءُ مِنْ عِبَادِهِۦ وَيَقْدِرُ لَهُۥ ۚ وَمَآ
أَنفَقْتُم مِّن شَىْءٍ فَهُوَ يُخْلِفُهُۥ ۖ وَهُوَ خَيْرُ ٱلرَّٰزِقِينَ ﴿٣٩﴾

(٣٢) دەسەڵاتدارو زۆردارەکانیش بە لاوازکراو و ژێردەستەکان دەڵێن: ئایا بۆچی ئێمە ڕێگەی هیدایەتمان لێ بەستبوون و نەماندەهێشت دوای ئەوکاتەی کە هیدایەت هاتبوو بۆتان ؟! نەخێر، وا نییە، بەڵکو ئێوە خۆتان تاوانبارو تاوانکار بوون.

(٣٣) دووبارە لاوازکراو و ژێردەستەکان وتیان بەزۆردارو دەسەڵاتدارەکان: نا، وانیە، بەڵکو پیلان و نەخشەی شەوانە ڕۆژ بوو کاتێک فەرمانتان پیادەداین بڕوامان بەخوا نەبێت (شوێنی ڕێگە و ڕێبازی نەکەوین)، هاوەڵی بۆ بڕیار بدەین، (پاشان هەموان) پەشیمانی لە دەرونیاندا دەشارنەوە بە تایبەتی کاتێک سزاو تۆڵەیان بینی بۆیان ئامادەیە، ئێمەش چەندەها کۆت و زنجیری ئاگرینمان کردە گەردنی ئەوانەوە کە بێبڕوا بوون، ئایا پاداشت دەدرێنەوە جگە بەوەی کە دەیانکرد؟

(٣٤) ئێمە لەهیچ شارو وڵاتێکدا پێغەمبەرێکی بێدارخەرەوەمان نەناردووە، کە خۆشگوزەرانەکان نەیانوتبێت: بەڕاستی ئێمە بێ بڕواین بەم بیروباوەڕەی کە بە ئێوەدا ڕەوانەکراوە!!

(٣٥) دەشیانوت: ئێمە سامان ونەوەی زۆرترمان هەیە، ئێمە لە قیامەتدا لە سزادراوان نین!!.

(٣٦) ئەی محمدﷺ پێیان بڵێ: بەڕاستی پەروەردگاری من رزق و ڕۆزی دەبەخشێت بە هەر کەسێک کە بیەوێت، یان کەمی دەکاتەوە و تەنگی دەکاتەوە (بێگومان هەردوو حاڵەتەکە بۆ تاقیکردنەوەیە) بەڵام زۆربەی خەڵکی بەنهێنی کارەکانمان نازانن و پەی پێنابەن.

(٣٧) لەڕاستیدا نە ماڵتان و نە نەوەتان نابنە هۆی ئەوەی کە بەتەواوی نزیکتان بخەنەوە لە ئێمە، مەگەر کەسێک باوەڕی هێنابێت وکاروکردەوەی چاکی ئەنجام دابێت، جا ئا ئەوانە پاداشتی چەند بەرابەریان هەیە بەهۆی ئەو کردەوانەی کەکردوویانە، هەر ئەوانیش لە کۆشک و تەلارەکانی بەهەشتدا بە ئاسوودەیی و ئارامی و خۆشی، ژیان دەبەنە سەر.

(٣٨) ئەوانەش کە هەوڵ وکۆشش دەدەن تا بەربەست بخەنە ڕێی ئایەتەکانی ئێمە بەخەیاڵی ئەوەی ئێمە دەستەوسان دەکەن، ئا ئەوانە بۆ ناو سزاو ئازار ڕاپێچ کراون (بە ناچاری).

(٣٩) ئەی پێغەمبەرﷺ پێیان بڵێ: بەڕاستی پەروەردگارم رزق و ڕۆزی دەبەخشێت بە هەرکەس لە بەندەکانی یان لێی دەگرێتەوە، ئێوەش هەر شتێک دەبەخشن ئەو زاتە جێی پڕدەکاتەوە (هەندێک جار هەر لەدنیادا، پاداشتی قیامەتیش بابوەستێت)، چونکە ئەو خوایە چاکترین رزق و ڕۆزی بەخشە (بەسەرجەم بەندەکانی).

وَيَوۡمَ يَحۡشُرُهُمۡ جَمِيعٗا ثُمَّ يَقُولُ لِلۡمَلَٰٓئِكَةِ أَهَٰٓؤُلَآءِ إِيَّاكُمۡ كَانُواْ يَعۡبُدُونَ ﴿٤٠﴾ قَالُواْ سُبۡحَٰنَكَ أَنتَ وَلِيُّنَا مِن دُونِهِمۖ بَلۡ كَانُواْ يَعۡبُدُونَ ٱلۡجِنَّۖ أَكۡثَرُهُم بِهِم مُّؤۡمِنُونَ ﴿٤١﴾ فَٱلۡيَوۡمَ لَا يَمۡلِكُ بَعۡضُكُمۡ لِبَعۡضٖ نَّفۡعٗا وَلَا ضَرّٗا وَنَقُولُ لِلَّذِينَ ظَلَمُواْ ذُوقُواْ عَذَابَ ٱلنَّارِ ٱلَّتِي كُنتُم بِهَا تُكَذِّبُونَ ﴿٤٢﴾ وَإِذَا تُتۡلَىٰ عَلَيۡهِمۡ ءَايَٰتُنَا بَيِّنَٰتٖ قَالُواْ مَا هَٰذَآ إِلَّا رَجُلٞ يُرِيدُ أَن يَصُدَّكُمۡ عَمَّا كَانَ يَعۡبُدُ ءَابَآؤُكُمۡ وَقَالُواْ مَا هَٰذَآ إِلَّآ إِفۡكٞ مُّفۡتَرٗىۚ وَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ لِلۡحَقِّ لَمَّا جَآءَهُمۡ إِنۡ هَٰذَآ إِلَّا سِحۡرٞ مُّبِينٞ ﴿٤٣﴾ وَمَآ ءَاتَيۡنَٰهُم مِّن كُتُبٖ يَدۡرُسُونَهَاۖ وَمَآ أَرۡسَلۡنَآ إِلَيۡهِمۡ قَبۡلَكَ مِن نَّذِيرٖ ﴿٤٤﴾ وَكَذَّبَ ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِهِمۡ وَمَا بَلَغُواْ مِعۡشَارَ مَآ ءَاتَيۡنَٰهُمۡ فَكَذَّبُواْ رُسُلِيۖ فَكَيۡفَ كَانَ نَكِيرِ ﴿٤٥﴾ ۞ قُلۡ إِنَّمَآ أَعِظُكُم بِوَٰحِدَةٍۖ أَن تَقُومُواْ لِلَّهِ مَثۡنَىٰ وَفُرَٰدَىٰ ثُمَّ تَتَفَكَّرُواْۚ مَا بِصَاحِبِكُم مِّن جِنَّةٍۚ إِنۡ هُوَ إِلَّا نَذِيرٞ لَّكُم بَيۡنَ يَدَيۡ عَذَابٖ شَدِيدٖ ﴿٤٦﴾ قُلۡ مَا سَأَلۡتُكُم مِّنۡ أَجۡرٖ فَهُوَ لَكُمۡۖ إِنۡ أَجۡرِيَ إِلَّا عَلَى ٱللَّهِۖ وَهُوَ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ شَهِيدٞ ﴿٤٧﴾ قُلۡ إِنَّ رَبِّي يَقۡذِفُ بِٱلۡحَقِّ عَلَّٰمُ ٱلۡغُيُوبِ ﴿٤٨﴾



(٤٠) رۆژێکیش دێت کە خوا تێکڕای هەموویان کۆ دەکاتەوە، ئەوسا روو بە فریشتەکان دەفەرموێت: بەڕاست! ئایا ئەو دەستە گومرایە ئێوەیان دەپەرست؟!

(٤١) لە وەڵامدا دەڵێن: پاکی و ستایش بۆ تۆ ئەی پەروەردگار تۆ یارو یاوەری ئێمەی نەک ئەوان، نەخێر؛ ئێمەیان نەدەپەرست، بەڵکو ئەوان پەریان دەپەرست، زۆربەیان باوەڕیان پێیان هەبوو (جادووگەرو دەجالەکان خەڵەتاندبوویانن).

(٤٢) جا ئیتر ئەمرۆ کەستان دەسەڵاتی ئەوەی نیە کە قازانجێک یان زەرەرێک بەکەسی ترتان بگەیەنێت، بەوانەش کە ستەمیان کردووە دەڵێین: دە بچێژن سزای ئەو ئاگرەی کە ئێوە بە درۆتان دەزانی و باوەڕتان پێ نەدەکرد.

(٤٣) کاتێکیش ئایەتە ئاشکراو روونەکانی ئێمە بەسەریاندا بخوێنرێتەوە، ئەوە کافران دەڵێن: ئەمە تەنها کابرایەکە و دەیەوێت لە رێگە و رێبازی باوو باپیرانتان وێڵتان بکات و هیچی تر، هەروەها دەڵێن: ئەمە تەنها درۆیەکی هەڵبەستراوە، ئەوانەش کە بێباوەڕ بوون دەربارەی ئەو حەق و راستیەی کە بۆیان هاتووە دەڵێن: ئا ئەمە تەنها سیحر و جادوویەکی ئاشکرایە و هیچی تر!!

(٤٤) جا خۆ ئێمە هیچ کتێب و نامەیەکمان بۆ نەناردوون تا بیخوێنن و لێی بکۆڵنەوە و پێش تۆش هیچ پێغەمبەرێکمان بۆ رەوانە نەکردوون کە بێداریان بکاتەوە (لە سزای بێ ئیمانی بیانترسێنێت).

(٤٥) ئەو خەڵکەی پێش ئەمانیش بروایان بە پێغەمبەرانی خوا نەکردووە، بەمەرجێک نەگەیشتوونەتە دەیەکی ئەوەی کە بەوانمان بەخشی بوو لە دەسەڵات و دارایی، کەچی لەگەڵ ئەوەشدا بەرنامەی پێغەمبەرەکانی منیان بە درۆزانی، جا ئایا نابینن چۆن بوو سزای من و چیم بەسەر هێنان؟!

(٤٦) پێیان بڵێ: بەراستی من هەر یەک ئامۆژگاری ئێوە دەکەم، کە بۆ خوا و لەبەر خوا، دوو قۆڵی یان بەتەنهایی، هەڵوێستە بکەن و پاشان بیربکەنەوە (لەم قورئانە، لەم پێغەمبەرە، لەم بەرنامەیە) ئەم هاوەڵەی ئێوە (محمدﷺ)، شێت نیە، (بەڵکو) ئەو تەنها ترسێنەرێکی ئێوەیە، هیچی تر، پێش ئەوەی سزایەکی سەخت رووبەڕووتان بێت...

(٤٧) پێیان بڵێ: هەرچی پاداشت و کرێیەکم داوا کردوە هەر بۆ خۆتان، من پاداشتم تەنها لەسەر خوایە، ئەو خوایەش شایەتە بەسەر هەموو شتێکەوە.

(٤٨) ئەی محمدﷺ بڵێ: بەڕاستی پەروەردگارم سەرئەنجام، حەق دەماڵێت بەسەر بەتاڵ و ناحەقیدا بەڕاستی ئەو زاتە شارەزاو زانایەکی بێ سنوورە بە نهێنی و شاراوەکان.

قُلۡ جَآءَ ٱلۡحَقُّ وَمَا يُبۡدِئُ ٱلۡبَٰطِلُ وَمَا يُعِيدُ ﴿٤٩﴾ قُلۡ إِن ضَلَلۡتُ فَإِنَّمَآ أَضِلُّ عَلَىٰ نَفۡسِيۖ وَإِنِ ٱهۡتَدَيۡتُ فَبِمَا يُوحِيٓ إِلَيَّ رَبِّيٓۚ إِنَّهُۥ سَمِيعٞ قَرِيبٞ ﴿٥٠﴾ وَلَوۡ تَرَىٰٓ إِذۡ فَزِعُواْ فَلَا فَوۡتَ وَأُخِذُواْ مِن مَّكَانٖ قَرِيبٖ ﴿٥١﴾ وَقَالُوٓاْ ءَامَنَّا بِهِۦ وَأَنَّىٰ لَهُمُ ٱلتَّنَاوُشُ مِن مَّكَانِۭ بَعِيدٖ ﴿٥٢﴾ وَقَدۡ كَفَرُواْ بِهِۦ مِن قَبۡلُۖ وَيَقۡذِفُونَ بِٱلۡغَيۡبِ مِن مَّكَانِۭ بَعِيدٖ ﴿٥٣﴾ وَحِيلَ بَيۡنَهُمۡ وَبَيۡنَ مَا يَشۡتَهُونَ كَمَا فُعِلَ بِأَشۡيَاعِهِم مِّن قَبۡلُۚ إِنَّهُمۡ كَانُواْ فِي شَكّٖ مُّرِيبِۭ ﴿٥٤﴾

سُورَةُ فَاطِر

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ فَاطِرِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ جَاعِلِ ٱلۡمَلَٰٓئِكَةِ رُسُلًا أُوْلِيٓ أَجۡنِحَةٖ مَّثۡنَىٰ وَثُلَٰثَ وَرُبَٰعَۚ يَزِيدُ فِي ٱلۡخَلۡقِ مَا يَشَآءُۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٞ ﴿١﴾ مَّا يَفۡتَحِ ٱللَّهُ لِلنَّاسِ مِن رَّحۡمَةٖ فَلَا مُمۡسِكَ لَهَاۖ وَمَا يُمۡسِكۡ فَلَا مُرۡسِلَ لَهُۥ مِنۢ بَعۡدِهِۦۚ وَهُوَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡحَكِيمُ ﴿٢﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱذۡكُرُواْ نِعۡمَتَ ٱللَّهِ عَلَيۡكُمۡۚ هَلۡ مِنۡ خَٰلِقٍ غَيۡرُ ٱللَّهِ يَرۡزُقُكُم مِّنَ ٱلسَّمَآءِ وَٱلۡأَرۡضِۚ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَۖ فَأَنَّىٰ تُؤۡفَكُونَ ﴿٣﴾

(٤٩) هەروەها بڵێ: حەق و ڕاستی هات و بەتاڵ و ناحەقی ئیتر دەرناکەوێت.. نە دەتوانێت دەست پێ بکاتەوە، نە دەتوانێت بگەڕێتەوە دۆخی جارانی.

(٥٠) بڵێ: ئەگەر من گومڕابم، ئەوە بێگومان گومڕاییەکەم لەسەر خۆم دەکەوێت، خۆ ئەگەر ڕێگەی هیدایەتیش بگرم، ئەوە بەهۆی نیگاو وەحی پەروەردگارمەوەیە کە بۆم دەنێرێت، بەڕاستی ئەوزاتە بیسەرو نزیکە.

(٥١) خۆ ئەگەر بێ باوەڕان ببینیت کاتێک لە ترسا خەریکن زیرە دەکەن، دڵنیان کە لە دەست دەرناچن و ڕزگاربوونیان ئەستەمە، ئیتر هەر لە نزیکەوە دەسگیر دەکرێن و باڵبەست دەکرێن.

(٥٢) ئەوکاتە بەناچاری دەڵێن : ئیمانمان بە پەروەردگارمان هێنا ، بەڵام لەو شوێنە دوورەوە ئیمانیان چۆن دەست دەکەوێت!

(٥٣) ئەوانە بەڕاستی کاتی خۆی باوەڕیان بە خوا نەبوو، هەر لە دوورەوە باسی نهێنی و شاراوەکانیان دەکردو دەمیان لێ دەکوتا (دوور لە زانست و زانیاری).

(٥٤) ئەوسا ئیتر لە نێوان ئەمان و ئەو شتانەی ئارەزووەی دەکەن بەربەست دانرا ، هەروەکو پێشتر بە هاو شێوەی ئەمان کرا (لە بێ باوەڕان)، بەڕاستی ئەوانە هەمیشە لە گومان و دوودڵیەکدا بوون کە خەڵکیی دەخستە گومانەوە.

سورەتی (فـاطر)

بەناوی خوای بەخشندە و میهرەبان

(١) سوپاس و ستایش بۆ خوایە، کە بەدیهێنەری ئاسمانەکان و زەویە، فریشتەکانی کردووە بە فرستادەی خۆی کە خاوەنی چەندەها باڵن، هەیانە دوو، یان سێ، یان چوار باڵە، لە دروستکردندا هەرچی بوێت زیادی دەکات (لە ژمارەی فریشتەکان، لە ئەستێرە و هەسارەکان، لە ئادەمیزاد و پەری..هتد) بەڕاستی خوا دەسەڵاتی بەسەر هەموو شتێکدا هەیە.

(٢) هەرکاتێک خوا دەروازەی ڕەحمەت و بەخششی خۆی لە خەڵکی بکاتەوە، ئەوە هیچ کەس و هیچ شتێک ناتوانێت بەری بگرێت، هەر کاتێکیش دەروازەی ڕەحمەتی بگرێتەوە و دای بخات، کەس ناتوانێت لەدوای گرتنەوەکەی خوا بێجگە لە خۆی بیکاتەوە، ئەو زاتە هەر خۆیشی باڵادەست و دانایە.

(٣) ئەی خەڵکینە بیربکەنەوە لە چاکەی خوا بەسەرتانەوە، ئایا دروستکارو بەدیهێنەرێکی تر هەیە جگە لە خوا لە ئاسمان و زەویەوە ڕزق و ڕۆزیتان پێ ببەخشێت؟ جگە لەو زاتە خوایەکی تر نیە، جا ئەوە چۆن لەو بیروباوەڕە دروستە لادەدرێن؟ (ڕوو دەکەنە گومڕایی).

وَإِن يُكَذِّبُوكَ فَقَدْ كُذِّبَتْ رُسُلٌ مِّن قَبْلِكَ ۚ وَإِلَى ٱللَّهِ تُرْجَعُ ٱلْأُمُورُ ﴿٤﴾ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِنَّ وَعْدَ ٱللَّهِ حَقٌّ ۖ فَلَا تَغُرَّنَّكُمُ ٱلْحَيَوٰةُ ٱلدُّنْيَا ۖ وَلَا يَغُرَّنَّكُم بِٱللَّهِ ٱلْغَرُورُ ﴿٥﴾ إِنَّ ٱلشَّيْطَـٰنَ لَكُمْ عَدُوٌّ فَٱتَّخِذُوهُ عَدُوًّا ۚ إِنَّمَا يَدْعُوا۟ حِزْبَهُۥ لِيَكُونُوا۟ مِنْ أَصْحَـٰبِ ٱلسَّعِيرِ ﴿٦﴾ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ لَهُمْ عَذَابٌ شَدِيدٌ ۖ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّـٰلِحَـٰتِ لَهُم مَّغْفِرَةٌ وَأَجْرٌ كَبِيرٌ ﴿٧﴾ أَفَمَن زُيِّنَ لَهُۥ سُوٓءُ عَمَلِهِۦ فَرَءَاهُ حَسَنًا ۖ فَإِنَّ ٱللَّهَ يُضِلُّ مَن يَشَآءُ وَيَهْدِى مَن يَشَآءُ ۖ فَلَا تَذْهَبْ نَفْسُكَ عَلَيْهِمْ حَسَرَٰتٍ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمٌۢ بِمَا يَصْنَعُونَ ﴿٨﴾ وَٱللَّهُ ٱلَّذِىٓ أَرْسَلَ ٱلرِّيَـٰحَ فَتُثِيرُ سَحَابًا فَسُقْنَـٰهُ إِلَىٰ بَلَدٍ مَّيِّتٍ فَأَحْيَيْنَا بِهِ ٱلْأَرْضَ بَعْدَ مَوْتِهَا ۚ كَذَٰلِكَ ٱلنُّشُورُ ﴿٩﴾ مَن كَانَ يُرِيدُ ٱلْعِزَّةَ فَلِلَّهِ ٱلْعِزَّةُ جَمِيعًا ۚ إِلَيْهِ يَصْعَدُ ٱلْكَلِمُ ٱلطَّيِّبُ وَٱلْعَمَلُ ٱلصَّـٰلِحُ يَرْفَعُهُۥ ۚ وَٱلَّذِينَ يَمْكُرُونَ ٱلسَّيِّـَٔاتِ لَهُمْ عَذَابٌ شَدِيدٌ ۖ وَمَكْرُ أُو۟لَـٰٓئِكَ هُوَ يَبُورُ ﴿١٠﴾ وَٱللَّهُ خَلَقَكُم مِّن تُرَابٍ ثُمَّ مِن نُّطْفَةٍ ثُمَّ جَعَلَكُمْ أَزْوَٰجًا ۚ وَمَا تَحْمِلُ مِنْ أُنثَىٰ وَلَا تَضَعُ إِلَّا بِعِلْمِهِۦ ۚ وَمَا يُعَمَّرُ مِن مُّعَمَّرٍ وَلَا يُنقَصُ مِنْ عُمُرِهِۦٓ إِلَّا فِى كِتَـٰبٍ ۚ إِنَّ ذَٰلِكَ عَلَى ٱللَّهِ يَسِيرٌ ﴿١١﴾

(٤) (پاشان دڵخۆشی پێغەمبەر ﷺ دەداتەوە و دەفەرمووێت): خۆ ئەگەر خوانەناسان بڕوات پێنەکەن، ئەوە دڵنیابە کە پێغەمبەرانی تریش پێش تۆ بڕوایان پێ نەکراوە، بەڵام غەمت نەبێت هەر بۆ لای خوا هەموو کارێک دەبڕێتەوە و ئەوانە لە دەستی دەرناچن.

(٥) ئەی خەڵکینە؛ دڵنیابن بەڵێنی خوا ڕاست و دروستە (قیامەت بەرپا دەکات و لە هەموو کەس دەپرسێتەوە) کەوابوو ژیانی ئەم دنیایە سەرتان لێ نەشێوێنێت و شەیتان نەتانخەڵەتێنێت بە ناوی ڕەحم و بەزەیی خواوە (کە گوایە هەرچی بکەن خوا بەبەزەیی‌یە و لێتان خۆش دەبێت).

(٦) چونکە بەڕاستی شەیتان دوژمنتانە ئێوەش بە دوژمنی خۆتانی دابنێن، بێگومان بانگی تاقم و داروودەستەی خۆی دەکات بۆ ئەوەی ببنە نیشتەجێی دۆزەخ.

(٧) ئەوانەی بێ بڕوا بوون سزای زۆر پڕ ئێش و ئازار چاوەڕێیانە، ئەوانەش باوەڕیان هێناوە و کردەوە چاکەکانیان ئەنجامداوە لێخۆشبوون و پاداشتی بێ سنوور چاوەڕێیانە و بۆیان ئامادەیە.

(٨) ئایا ئەو کەسەی کە کردەوە ناشیرینەکانی بۆ ڕازێنراوەتەوە و بەجوان و چاک دەیبینێت؟! (وەک ئەو کەسە وایە کە پێوەری خوایی پێیە بۆ چاکە و خراپە)؟ بەڕاستی خوا بیەوێت هەر کەس گومڕا بکات دەیکات، هەر کەسێکیش هیدایەت بدات دەیدات، (ئەڵبەتە نەک بەشێوەی هەڕەمەکی) کەواتە تۆ بە خەفەتیانەوە خۆت مەفەوتێنە، چونکە بەڕاستی خوا ئاگاو زانایە بەو کاروکردەوانەی ئەنجامی دەدەن.

(٩) خوا ئەو زاتەیە کە بای ڕەحمەت دەنێرێت و هەڵمی دەریاکانی پێ دەگوێزێتەوە و دەیکاتە هەور، جا دەینێرین بۆ وڵاتێکی وشک و مردوو، دەفەرمووێت: ئینجا ئەو زەویەمان پێ زیندوو کردەوە دوای ئەوەی کە مردبوو، زیندوو کردنەوەی ئێوەش هەر بەو شێوەیە دەبێت.

(١٠) ئەوەی سەربەرزی و پایەبڵندی دەوێت، با بزانێت کە هەموو سەربەرزی و پایە بڵندیەک هەر بۆ خوایە، گوفتاری چاک و جوان و بەجێ بۆ لای ئەو زاتە بەرز دەبێتەوە، کاروکردەوەی چاکیش گوفتاری شیرین بەرز دەکاتەوە (هەروەها پێچەوانەکەشی هەروایە)، جا ئەوانەی کە پیلانی خراپ دەگێڕن سزای زۆر توندو تیژ بۆیان ئامادەیە، پیلانی ئەوانە هەر خۆی پووچ دەبێتەوە و بێ بەروو بووم و ناکامە.

(١١) خوا؛ ئێوەی لە خاک دروستکردوە، لەوەودواش لە نوتفەیەک (کە بریتیە لە بەیەکگەیشتنی سەرەمێکوتەیەک لەگەڵ هێلکۆکەیەکدا) لەوەودوا کردوونی بەجووت (بە نێرو مێ)، هیچ مێینەیەک ئاوس نابێت و نازێت و سکەکەی دانانێت تەنها بە ئاگاداری ئەو زاتە نەبێت، هیچ تەمەن درێژێک، تەمەنی درێژ نابێت و لە تەمەنی کەم نابێتەوە، بێ ئەوەی لە زانستی خوادا یاداشت نەکرابێت، بێگومان ئەو شتە لەسەر خوا ئاسانە.

وَمَا يَسْتَوِي الْبَحْرَانِ هَٰذَا عَذْبٌ فُرَاتٌ سَائِغٌ شَرَابُهُ وَهَٰذَا مِلْحٌ أُجَاجٌ ۖ وَمِن كُلٍّ تَأْكُلُونَ لَحْمًا طَرِيًّا وَتَسْتَخْرِجُونَ حِلْيَةً تَلْبَسُونَهَا ۖ وَتَرَى الْفُلْكَ فِيهِ مَوَاخِرَ لِتَبْتَغُوا مِن فَضْلِهِ وَلَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ ﴿١٢﴾ يُولِجُ اللَّيْلَ فِي النَّهَارِ وَيُولِجُ النَّهَارَ فِي اللَّيْلِ وَسَخَّرَ الشَّمْسَ وَالْقَمَرَ كُلٌّ يَجْرِي لِأَجَلٍ مُّسَمًّى ۚ ذَٰلِكُمُ اللَّهُ رَبُّكُمْ لَهُ الْمُلْكُ ۚ وَالَّذِينَ تَدْعُونَ مِن دُونِهِ مَا يَمْلِكُونَ مِن قِطْمِيرٍ ﴿١٣﴾ إِن تَدْعُوهُمْ لَا يَسْمَعُوا دُعَاءَكُمْ وَلَوْ سَمِعُوا مَا اسْتَجَابُوا لَكُمْ ۖ وَيَوْمَ الْقِيَامَةِ يَكْفُرُونَ بِشِرْكِكُمْ ۚ وَلَا يُنَبِّئُكَ مِثْلُ خَبِيرٍ ﴿١٤﴾ ۞ يَا أَيُّهَا النَّاسُ أَنتُمُ الْفُقَرَاءُ إِلَى اللَّهِ ۖ وَاللَّهُ هُوَ الْغَنِيُّ الْحَمِيدُ ﴿١٥﴾ إِن يَشَأْ يُذْهِبْكُمْ وَيَأْتِ بِخَلْقٍ جَدِيدٍ ﴿١٦﴾ وَمَا ذَٰلِكَ عَلَى اللَّهِ بِعَزِيزٍ ﴿١٧﴾ وَلَا تَزِرُ وَازِرَةٌ وِزْرَ أُخْرَىٰ ۚ وَإِن تَدْعُ مُثْقَلَةٌ إِلَىٰ حِمْلِهَا لَا يُحْمَلْ مِنْهُ شَيْءٌ وَلَوْ كَانَ ذَا قُرْبَىٰ ۗ إِنَّمَا تُنذِرُ الَّذِينَ يَخْشَوْنَ رَبَّهُم بِالْغَيْبِ وَأَقَامُوا الصَّلَاةَ ۚ وَمَن تَزَكَّىٰ فَإِنَّمَا يَتَزَكَّىٰ لِنَفْسِهِ ۚ وَإِلَى اللَّهِ الْمَصِيرُ ﴿١٨﴾



(١٢) هەردوو جۆرە دەریا وەکو یەک نین ، یەکێکیان ئاوی سازگار و خۆش ، ئەوی تریان سوێر و تاڵ ، لە هەردووکیان گۆشتی تەڕو تازە دەخۆن ، جۆرەها شتی گرانبەها (وەک گەوهەرو مرواری و یاقووت و .. هتد ) دەردەهێنن و لەبەری دەکەن و خۆتانی پێ دەڕازێننەوە ، ئینجا کەشتییەکان دەبینیت ناوەکە لەت دەکەن و (بە ئاسانی پیایدا دەڕۆن) تا لە بەخششەکانی پەروەردگار بەهرەوەر ببن، بۆ ئەوەی سوپاسگوزاریش بن.

(١٣) (هەر خوایە کە): شەو تێهەڵکێشی ڕۆژ دەکات ، ڕۆژیش تێهەڵکێشی شەو دەکات ، خۆرو مانگی ڕامهێناوە ، هەریەکەیان تاکاتێکی دیاری کراو لە سووڕانەوەدایە ، ئائەو خوایە پەروەردگارتانە خاوەنی هەموو موڵک و بەدیهاتووەکانە، (بەڵام) ئەوانەی جگە لەو هاناو هاواری بۆ دەبەن و لێی دەپاڕێنەوە تەنانەت خاوەنی توێکڵە تەنکەکەی دەوری ناوکی خورمایش نین.

(١٤) خۆ ئەگەر هاناو هاواریان بۆ بەرن گوێیان لێتان نییە و نابیستن، ئەگەر بشبیستن بەدەمتانەوە نایەن ، ڕۆژی قیامەتیش حاشا دەکەن لێتان و لەوەی کە بە (خواتان) زانیوون، بێگومان کەس نییە وەک (خوا) ئاگاو زانا بێت و هەواڵی ڕاست و دروست بگەیەنێت.

(١٥) ئەی خەڵکینە ئێوە هەژارو نەدارن و هەمیشە ئاتاجی خوان، ( لە هەموو کات و شوێنێکدا و بۆ هەموو شتێک) هەر تەنها خوایە کە بێ نیازە و شایانی سوپاسە.

(١٦) ئەگەر بیەوێت ئێوە لەناو دەبات و کەسانی تر سەرلەنوێ دەهێنێتە کایەوە.

(١٧) ئەمەش بۆ خوا زۆر کارێکی ئاسانە و ( ئەنجامدانی هیچی پێ ناچێت).

(١٨) هیچ گوناهبارێکیش گوناهی کەسانی تر هەڵناگرێت ( لە قیامەتیشدا ) ئەگەر بارگرانێک (گوناهبارێک) هاوار لە کەسێک بکات تا باری سەرشانی سووک بکات هیچ باری سووک ناکات هەتا ئەگەر خزمیشی بێت، (جا تۆ ئەی پێغەمبەر ﷺ )تەنها ئەوانە بێدار دەکەیتەوە کە لە پەروەردگاریان دەترسن لەغەیب و پەنهانییدا و نوێژەکانیان بەچاکی ئەنجام دەدەن، ئەوسا ئەوەی دڵ و دەروون و گوفتارو کردەوەی خۆی پاک بکاتەوە، ئەوە بەڕاستی سوودەکەی بۆ خۆیەتی، گەڕانەوە و سەرەنجامیش بۆ لای خوای گەورەیە.

وَمَا يَسْتَوِي الْأَعْمَىٰ وَالْبَصِيرُ ﴿١٩﴾ وَلَا الظُّلُمَاتُ وَلَا النُّورُ ﴿٢٠﴾ وَلَا الظِّلُّ وَلَا الْحَرُورُ ﴿٢١﴾ وَمَا يَسْتَوِي الْأَحْيَاءُ وَلَا الْأَمْوَاتُ ۚ إِنَّ اللَّهَ يُسْمِعُ مَن يَشَاءُ ۖ وَمَا أَنتَ بِمُسْمِعٍ مَّن فِي الْقُبُورِ ﴿٢٢﴾ إِنْ أَنتَ إِلَّا نَذِيرٌ ﴿٢٣﴾ إِنَّا أَرْسَلْنَاكَ بِالْحَقِّ بَشِيرًا وَنَذِيرًا ۚ وَإِن مِّنْ أُمَّةٍ إِلَّا خَلَا فِيهَا نَذِيرٌ ﴿٢٤﴾ وَإِن يُكَذِّبُوكَ فَقَدْ كَذَّبَ الَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ جَاءَتْهُمْ رُسُلُهُم بِالْبَيِّنَاتِ وَبِالزُّبُرِ وَبِالْكِتَابِ الْمُنِيرِ ﴿٢٥﴾ ثُمَّ أَخَذْتُ الَّذِينَ كَفَرُوا ۖ فَكَيْفَ كَانَ نَكِيرِ ﴿٢٦﴾ أَلَمْ تَرَ أَنَّ اللَّهَ أَنزَلَ مِنَ السَّمَاءِ مَاءً فَأَخْرَجْنَا بِهِ ثَمَرَاتٍ مُّخْتَلِفًا أَلْوَانُهَا ۚ وَمِنَ الْجِبَالِ جُدَدٌ بِيضٌ وَحُمْرٌ مُّخْتَلِفٌ أَلْوَانُهَا وَغَرَابِيبُ سُودٌ ﴿٢٧﴾ وَمِنَ النَّاسِ وَالدَّوَابِّ وَالْأَنْعَامِ مُخْتَلِفٌ أَلْوَانُهُ كَذَٰلِكَ ۗ إِنَّمَا يَخْشَى اللَّهَ مِنْ عِبَادِهِ الْعُلَمَاءُ ۗ إِنَّ اللَّهَ عَزِيزٌ غَفُورٌ ﴿٢٨﴾ إِنَّ الَّذِينَ يَتْلُونَ كِتَابَ اللَّهِ وَأَقَامُوا الصَّلَاةَ وَأَنفَقُوا مِمَّا رَزَقْنَاهُمْ سِرًّا وَعَلَانِيَةً يَرْجُونَ تِجَارَةً لَّن تَبُورَ ﴿٢٩﴾ لِيُوَفِّيَهُمْ أُجُورَهُمْ وَيَزِيدَهُم مِّن فَضْلِهِ ۚ إِنَّهُ غَفُورٌ شَكُورٌ ﴿٣٠﴾

ئاشکرایە کە کوێرو چاوساغ وەک یەک نین.
تاریکیەکان و روناکیش چون یەک نین.
سێبەرو خۆرەتاویش وەک یەک نین.
زیندووان و مردووانیش هاوتای یەک نین بێگومان خوا راستی دەدات بەگوێی هەرکەسێکدا بیەوێت بەڵام تۆ ئەی پێغەمبەر ناتوانیت پەیامەکەت بگەیەنیت بەو کەسانەی کە لەناو گۆڕدان (مەبەست کافرانە کە وەک مردوو نابیستن و ئەگەر بشبیستن سوودی لێ وەرناگرن).
بەڵکو تۆ ئەی پێغەمبەر تەنها بێدارکەرەوە و ترسێنەریت و بەس.
بێگومان ئێمە تۆمان رەوانەکردووە بەحەق و راستیەکی تەواوەوە، تۆ مژدەدەری (ئیماندارانیت)، ترسێنەری (بێبڕواکانیت)هیچ گەل و نەتەوەیەکیش نەبووە کە فرستادە و بێدارکەرەوەیەکی بۆ رەوانە نەکرابێت.
ئەی محمد خۆ ئەگەر بڕوایان بە تۆ نەکرد ئەوە دڵت لە خۆت دانەمێنێت، بەڕاستی ئەوانەی پێش ئەمانیش هەر هەڵوێستیان وابووە، بڕوایان بە پێغەمبەران نەبووە، هەرچەندە ئەوان بە موعجیزەو بەڵگەی بەهێزەوە، بەپەیام و کتێبی روون و ئاشکراوە بۆیان رەوانە کرابوون.
پاشان ئەوانەی بێ باوەڕبوون خەشم و قینی خۆمم لێگرتن و لەناوم بردن، جا چۆن بوو بەڵاو تۆڵەی من.

ئایا سەرنجت نەداوە کە بەڕاستی خوا لە ئاسمانەوە بارانی باراندووە، جا ئێمە بەو بارانە جۆرەها بەروبوومی جیاوازمان دەرهێنا کە (رەنگیان، قەبارەیان، تامیان، بۆنیان، شێوەیان، شوێنیان، وەرزیان) جیاوازە.. هەروەها هەندێ لەکەژو کێوەکانمان بەزنجیرە کێشاوە، هەیانە چین و هێڵ و ئەخشی سپی و سوورە و ئەوانیش رەنگیان جیاوازە، هەشیانە رەشێکی تاریک و تۆخە..

هەروەها بەو شێوەیە لە خەڵکیش، لە گیانداران و ماڵاتیش، جۆرەها رەنگ و شێوە و قەبارەی جیاواز هەیە. بەڕاستی هەر زاناکان پەی بەو نهێنیانە دەبەن و لەناو بەندەکانی خوادا هەر ئەوان لەخوا دەترسن (لە سەردەمی علم و زانستیدا ئەم راستیە روونە چونکە زانا و پسپۆڕان کاتێک وردەکاری بەدیهێنراوان پەی پێ دەبەن، زۆر هەست بە گەورەیی و دەسەڵاتی خوا دەکەن)، بەڕاستی ئەو خوایە زۆر باڵادەستە و، زۆریش لێخۆشبووە (کاتێک رووی تێ دەکەن و باوەڕی پێ دەهێنن).

بەڕاستی ئەوانەی کە پەیامی خوا، قورئان دەخوێننەوە و نوێژەکانیان بەچاکی ئەنجامداوە و لەو رزق و رۆزی و سامانە جۆراو جۆرانەی پێمان بەخشیوون، بەخشیوویانە، بەنهێنی و بەئاشکرا.. (بەنهێنی بۆ ئەوەی ریاو رووپامایی تێکەڵ نەبێت، بە ئاشکراش بۆ هاندانی خەڵکی) ئەوانە بەئومێدی بازرگانیەک ئەوکارە دەکەن کە هەرگیز نائومێد و زەرەمەند نابن.

بۆ ئەوەی خوای میهرەبانیش وەفا بکات بە بەخشینی پاداشت بۆیان و لە خەڵات و بەخششی زیاتریش بەهرەمەندیان بکات، بەڕاستی ئەو خوایە لێخۆشبوو و سوپاسگوزارە..

وَٱلَّذِيٓ أَوۡحَيۡنَآ إِلَيۡكَ مِنَ ٱلۡكِتَٰبِ هُوَ ٱلۡحَقُّ مُصَدِّقٗا لِّمَا بَيۡنَ يَدَيۡهِۗ إِنَّ ٱللَّهَ بِعِبَادِهِۦ لَخَبِيرُۢ بَصِيرٞ ﴿٣١﴾ ثُمَّ أَوۡرَثۡنَا ٱلۡكِتَٰبَ ٱلَّذِينَ ٱصۡطَفَيۡنَا مِنۡ عِبَادِنَاۖ فَمِنۡهُمۡ ظَالِمٞ لِّنَفۡسِهِۦ وَمِنۡهُم مُّقۡتَصِدٞ وَمِنۡهُمۡ سَابِقُۢ بِٱلۡخَيۡرَٰتِ بِإِذۡنِ ٱللَّهِۚ ذَٰلِكَ هُوَ ٱلۡفَضۡلُ ٱلۡكَبِيرُ ﴿٣٢﴾ جَنَّٰتُ عَدۡنٖ يَدۡخُلُونَهَا يُحَلَّوۡنَ فِيهَا مِنۡ أَسَاوِرَ مِن ذَهَبٖ وَلُؤۡلُؤٗاۖ وَلِبَاسُهُمۡ فِيهَا حَرِيرٞ ﴿٣٣﴾ وَقَالُواْ ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ ٱلَّذِيٓ أَذۡهَبَ عَنَّا ٱلۡحَزَنَۖ إِنَّ رَبَّنَا لَغَفُورٞ شَكُورٌ ﴿٣٤﴾ ٱلَّذِيٓ أَحَلَّنَا دَارَ ٱلۡمُقَامَةِ مِن فَضۡلِهِۦ لَا يَمَسُّنَا فِيهَا نَصَبٞ وَلَا يَمَسُّنَا فِيهَا لُغُوبٞ ﴿٣٥﴾ وَٱلَّذِينَ كَفَرُواْ لَهُمۡ نَارُ جَهَنَّمَ لَا يُقۡضَىٰ عَلَيۡهِمۡ فَيَمُوتُواْ وَلَا يُخَفَّفُ عَنۡهُم مِّنۡ عَذَابِهَاۚ كَذَٰلِكَ نَجۡزِي كُلَّ كَفُورٖ ﴿٣٦﴾ وَهُمۡ يَصۡطَرِخُونَ فِيهَا رَبَّنَآ أَخۡرِجۡنَا نَعۡمَلۡ صَٰلِحًا غَيۡرَ ٱلَّذِي كُنَّا نَعۡمَلُۚ أَوَلَمۡ نُعَمِّرۡكُم مَّا يَتَذَكَّرُ فِيهِ مَن تَذَكَّرَ وَجَآءَكُمُ ٱلنَّذِيرُۖ فَذُوقُواْ فَمَا لِلظَّٰلِمِينَ مِن نَّصِيرٍ ﴿٣٧﴾ إِنَّ ٱللَّهَ عَٰلِمُ غَيۡبِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۚ إِنَّهُۥ عَلِيمُۢ بِذَاتِ ٱلصُّدُورِ ﴿٣٨﴾

(٣١) ئەی پێغەمبەر ﷺ ئەوەی کە بەوەحی و نیگا بۆمان رەوانەکردیت لەم قورئانە، ئەوە حەق و راستیەو بەراست دانەری کتێبە پێشوەکانیشە، بەڕاستی خوا ئاگاو بینایە بە بەندەکانی.

(٣٢) پاشان کەسانێکمان کردە خاوەن و راگەیەنەری ئەم قورئانە کە هەڵمانبژاردوون لە بەندەکانمان، جا هەیانە ستەمی لەخۆی کردووە (چاکەی کەمە و گوناهی زۆرە)، هەشیانە مام ناوەندیە، هەشیانە زۆرگەرم و گوڕە لە چاکەکاریدا بە ویست و یارمەتی خوا، ئا ئەو هەڵبژاردنە و ئەو گەرم و گوڕیە لە چاکەکاریدا، رێز و خەلاتێکی زۆر گەورەیە..

(٣٣) ئەو بەختەوەرانە (لە پاداشتی ئەو هەوڵ و کۆششانەیاندا) دەچنە باخەکانی بەهەشتی - عدن - ەوە، لەوێ دەستبەندی ئاڵتون و مرواری دەکرێتە دەستیان، پۆشاکیشیان لەو بەهەشتەدا ئاوریشمە.

(٣٤) ئینجا هەمووان لە خۆشیدا دەڵێن: سوپاس و ستایش بۆئەو خوایەی کە هەرچی غەم و پەژارەیە لە دڵ و دەروونی دەرکردین، بەڕاستی پەروەردگارمان زۆر لێخۆشبوو سوپاسگوزارە.

(٣٥) ئەو خوایەی کە جێنشینی کردین لە ماڵی هەمیشەیدا بە بەخشش و رێزی تایبەتی خۆی ئیتر هیچ نەخۆشی و ناخۆشیەک توخنمان ناکەوێت، هیچ ئازارو ئێشێکی دەروونی توشمان نابێت و هیچ بێزاری و ماندووبوونێکیش رومان تێناکات.

(٣٦) لەولاشەوە ئەوانەی کە کافرو بێباوەڕبوون، دۆزەخ بۆیان ئامادەیە، بڕیاری لەناوچوونیان نادرێت، تا بمرن و رزگاریان ببێت!! تەنانەت بەشێک لە سزاکەش لەسەریان کەم ناکرێتەوە، ئا بەو شێوەیە هەموو کافرو بێباوەڕە سەرسەختەکان سزا دەدرێن و تۆڵەیان لێ دەستێنین.

(٣٧) ئەوانە گریە و زاری و هاوارو قیژە و ناڵەیان لەناو دۆزەخدا لێ بەرز دەبێتەوە و بەکەساسیەوە دەڵێن پەروەردگارا: دەرمان بهێنە و رزگارمان بکە لەم حاڵە، مەرج بێت کارو کردەوەی چاک ئەنجام بدەین، نەک ئەوەی کە جاران دەمانکرد، لە وەلامیاندا خوا دەفەرموێت: ئایا ئەوەندە تەمەنمان پێ نەبەخشین؟ ئەوەی بیەوێت بیرێک بکاتەوە تیایدا بیربکاتەوە ؟! بێدارکەرەوەشتان بۆ هات، (دیارە هەموویان خەجاڵەت و سەرشۆڕدەبن و قسەیان نامێنێت)، بۆیە پێیان دەوترێت: کەواتە دە بچێژن سزای سەختی دۆزەخ، چونکە ستەمکاران هیچ پشتیوانێکیان نیە.

(٣٨) بەڕاستی خوا زاناو شارەزای نهێنیەکانی ئاسمانەکان و زەویە، بەڕاستی ئەو زاتە زانایە بەوەی کە لە سینە و دڵ و دەروونەکاندا حەشاردراوە..

هُوَ ٱلَّذِي جَعَلَكُمۡ خَلَٰٓئِفَ فِي ٱلۡأَرۡضِۚ فَمَن كَفَرَ فَعَلَيۡهِ كُفۡرُهُۥۖ وَلَا يَزِيدُ ٱلۡكَٰفِرِينَ كُفۡرُهُمۡ عِندَ رَبِّهِمۡ إِلَّا مَقۡتٗاۖ وَلَا يَزِيدُ ٱلۡكَٰفِرِينَ كُفۡرُهُمۡ إِلَّا خَسَارٗا ﴿٣٩﴾ قُلۡ أَرَءَيۡتُمۡ شُرَكَآءَكُمُ ٱلَّذِينَ تَدۡعُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ أَرُونِي مَاذَا خَلَقُواْ مِنَ ٱلۡأَرۡضِ أَمۡ لَهُمۡ شِرۡكٞ فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ أَمۡ ءَاتَيۡنَٰهُمۡ كِتَٰبٗا فَهُمۡ عَلَىٰ بَيِّنَتٖ مِّنۡهُۚ بَلۡ إِن يَعِدُ ٱلظَّٰلِمُونَ بَعۡضُهُم بَعۡضًا إِلَّا غُرُورًا ﴿٤٠﴾ ۞ إِنَّ ٱللَّهَ يُمۡسِكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَ أَن تَزُولَاۚ وَلَئِن زَالَتَآ إِنۡ أَمۡسَكَهُمَا مِنۡ أَحَدٖ مِّنۢ بَعۡدِهِۦٓۚ إِنَّهُۥ كَانَ حَلِيمًا غَفُورٗا ﴿٤١﴾ وَأَقۡسَمُواْ بِٱللَّهِ جَهۡدَ أَيۡمَٰنِهِمۡ لَئِن جَآءَهُمۡ نَذِيرٞ لَّيَكُونُنَّ أَهۡدَىٰ مِنۡ إِحۡدَى ٱلۡأُمَمِۖ فَلَمَّا جَآءَهُمۡ نَذِيرٞ مَّا زَادَهُمۡ إِلَّا نُفُورًا ﴿٤٢﴾ ٱسۡتِكۡبَارٗا فِي ٱلۡأَرۡضِ وَمَكۡرَ ٱلسَّيِّيِٕۚ وَلَا يَحِيقُ ٱلۡمَكۡرُ ٱلسَّيِّئُ إِلَّا بِأَهۡلِهِۦۚ فَهَلۡ يَنظُرُونَ إِلَّا سُنَّتَ ٱلۡأَوَّلِينَۚ فَلَن تَجِدَ لِسُنَّتِ ٱللَّهِ تَبۡدِيلٗاۖ وَلَن تَجِدَ لِسُنَّتِ ٱللَّهِ تَحۡوِيلًا ﴿٤٣﴾ أَوَلَمۡ يَسِيرُواْ فِي ٱلۡأَرۡضِ فَيَنظُرُواْ كَيۡفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِهِمۡ وَكَانُوٓاْ أَشَدَّ مِنۡهُمۡ قُوَّةٗۚ وَمَا كَانَ ٱللَّهُ لِيُعۡجِزَهُۥ مِن شَيۡءٖ فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَلَا فِي ٱلۡأَرۡضِۚ إِنَّهُۥ كَانَ عَلِيمٗا قَدِيرٗا ﴿٤٤﴾



(٣٩) هەر ئەو زاتە ئێوەی کردە جێنشین لە زەویدا، جا ئەوەی کە کافرو بێ بڕوا بێت، ئەوە کافر بوونەکەی لەسەری دەکەوێت، بێ باوەڕیی کافران، هیچیان لای پەروەردگاریان بۆ زیاد ناکات، جگە لە خەشم و قینی خوا لێیان، خوانەناسی کافران هیچ دەستکەوتێکی نیە جگە لە خسارەت مەندی و زەرەرمەندی نەبڕاوە.

(٤٠) ئەی پێغەمبەر ﷺ پێیان بڵێ: هەواڵم بدەنێ دەربارەی ئەو شتانەی کردوتانە بە هاوەڵ بۆ خوا و هاناو هاواریان بۆ دەبەن جگە لە خوا، پیشانم بدەن کام شوێنی زەویان دروست کردووە، ئایا بەشداریەکیان هەیە لەگەڵ خوادا لە دروستکردنی ئاسمانەکاندا!! یاخود کتێبێکمان پێبەخشیوون تا دڵنیابن لە هاوکاریی بتەکان!! نەخێر وانیە، بەڵکو ئەو ستەمکارانە هیچ بەڵێنێک بە یەکتری نادەن، تەنها خەڵەتاندن نەبێت.

(٤١) بەڕاستی هەر خوایە کە ئاسمانەکان و زەوی رادەگرێت و نایەڵێت لەناو بچێت و لەیەک بترازێت، سوێند بە خوا ئەگەر تێک بچن و لەیەک بترازێن، ئەوە هیچ کەسێک نیە بتوانێت دوای ئەو زاتە فریایان بکەوێت، بەڕاستی هەر ئەو هەمیشە و بەردەوام خۆگر و ئارامگر و لێخۆشبووە.

(٤٢) ئەو کافرو هاوەڵگەرانەی قوڕەیش زۆر بەگەرمی بەخوا سوێندیان دەخواردو دەیانوت: ئەگەر پێغەمبەرێکی بێدارکەرەوە بۆیان بێت، بێگومان لە هەموو گەلانی تر باوەڕدارتر دەبن، کەچی کاتێ کە پێغەمبەرێکیان بۆ هات لەسەرکەشی و دووره پەرێزی زیاتر هیچی تریان لێ نەوەشایەوە...

(٤٣) چونکە خۆیان بەزل وگەورە دەزانی لە زەویدا و پیلانی شەڕ و تاوانیان کێشا، بەمەرجێک پیلانی شەڕ و تاوان تەنها بەسەر ئەوانەدا دەشکێتەوە کە نەخشەی بۆ دەکێشن، مەگەر ئەمانە بەدژایەتی ئیسلام تەنها چاوەڕێی ئەو کارەساتانە بکەن کە بەسەر گەلانی پێش ئەماندا هاتووە، (کاتێ بڕوایان بە پێغەمبەران نەهێناوە، لەناوبران) ئیتر تۆ نابینیت هەرگیز لە یاسا و بەرنامەکانی خوادا گۆڕانکاری پێش بێت، هەرگیز نابینیت یاسا و بەرنامەکانی خوا لە نەخشەی خۆیان لابدەن. (کە بەشێکی ریسواکردنی پیلانگێرانە).

(٤٤) ئایا ئەوە نەگەڕاون بە زەویدا، تا سەرنج بدەن و تەماشا بکەن، چۆن بوو سەرئەنجامی گەلانی پێش ئەمان و چیمان بەسەر هێنان، ئەوانە هێز و دەسەلاتیان لەمان زیاتر بوو، وەنەبێت خوا هیچ شتێک دەستەوسانی بکات لە ئاسمانەکان، یان لە زەویدا، چونکە بەڕاستی ئەو زاتە هەمیشە و بەردەوام زانایە و بەدەسەلات و توانایە.

وَلَوْ يُؤَاخِذُ ٱللَّهُ ٱلنَّاسَ بِمَا كَسَبُوا۟ مَا تَرَكَ عَلَىٰ ظَهْرِهَا مِن دَآبَّةٍ وَلَٰكِن يُؤَخِّرُهُمْ إِلَىٰٓ أَجَلٍ مُّسَمًّى فَإِذَا جَآءَ أَجَلُهُمْ فَإِنَّ ٱللَّهَ كَانَ بِعِبَادِهِۦ بَصِيرًۢا ﴿٤٥﴾

سُورَةُ يسٓ

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

يسٓ ﴿١﴾ وَٱلْقُرْءَانِ ٱلْحَكِيمِ ﴿٢﴾ إِنَّكَ لَمِنَ ٱلْمُرْسَلِينَ ﴿٣﴾ عَلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ ﴿٤﴾ تَنزِيلَ ٱلْعَزِيزِ ٱلرَّحِيمِ ﴿٥﴾ لِتُنذِرَ قَوْمًا مَّآ أُنذِرَ ءَابَآؤُهُمْ فَهُمْ غَٰفِلُونَ ﴿٦﴾ لَقَدْ حَقَّ ٱلْقَوْلُ عَلَىٰٓ أَكْثَرِهِمْ فَهُمْ لَا يُؤْمِنُونَ ﴿٧﴾ إِنَّا جَعَلْنَا فِىٓ أَعْنَٰقِهِمْ أَغْلَٰلًا فَهِىَ إِلَى ٱلْأَذْقَانِ فَهُم مُّقْمَحُونَ ﴿٨﴾ وَجَعَلْنَا مِنۢ بَيْنِ أَيْدِيهِمْ سَدًّا وَمِنْ خَلْفِهِمْ سَدًّا فَأَغْشَيْنَٰهُمْ فَهُمْ لَا يُبْصِرُونَ ﴿٩﴾ وَسَوَآءٌ عَلَيْهِمْ ءَأَنذَرْتَهُمْ أَمْ لَمْ تُنذِرْهُمْ لَا يُؤْمِنُونَ ﴿١٠﴾ إِنَّمَا تُنذِرُ مَنِ ٱتَّبَعَ ٱلذِّكْرَ وَخَشِىَ ٱلرَّحْمَٰنَ بِٱلْغَيْبِ ۖ فَبَشِّرْهُ بِمَغْفِرَةٍ وَأَجْرٍ كَرِيمٍ ﴿١١﴾ إِنَّا نَحْنُ نُحْىِ ٱلْمَوْتَىٰ وَنَكْتُبُ مَا قَدَّمُوا۟ وَءَاثَٰرَهُمْ ۚ وَكُلَّ شَىْءٍ أَحْصَيْنَٰهُ فِىٓ إِمَامٍ مُّبِينٍ ﴿١٢﴾

(٤٥) خۆ ئەگەر خوا تۆڵەی لە خەڵکی بسەندایە لە سەرەنجامی کارو کردەوەی نادروستیاندا، هەرچی زیندەوەر هەیە لەسەر رووکاری زەوی نەدەما، بەڵام خوا ئەوەندە بەپەلە نیە لە تۆڵەسەندن، بەڵکو دوایان دەخات بۆ کاتێکی دیاریکراو، جا کاتێک رۆژی خۆی هات، بێگومان ئەوکاتە خوای گەورە بینایە بە بەندەکانی (کارو کردەوەیانی هەموو لەبەردەست دایە).

سوورەتی (یــس)

بەناوی خوای بەخشندە و میهرەبان

(١) سەرنجی سەرەتای سوورەتی (البقرة) بدە.

(٢) سوێند بەو قورئانەی کە هەموو فەرمانێکی لە شوێنی خۆیایەتی...

(٣) بەڕاستی تۆ ئەی محمد ﷺ لە فرستادە و پێغەمبەرانیت...

(٤) لەسەر رێگەو رێبازێکی راست و دروستیت.

(٥) ئەم قورئانە لەلایەن زاتێکی خاوەن دەسەڵات و میهرەبانەوە دابەزیووە و رەوانە کراوە...

(٦) بۆ ئەوەی گەل و هۆزێکی پێ بێدار بکەیتەوە کە باوو باپیرانیان بێدار نەکراونەتەوەو بەبێ ئاگایی و نەشارەزایی ماونەتەوە.

(٧) سوێند بە خوا بەڕاستی بڕیاری خوا هاتە دی لەسەر زۆربەیان کە دۆزەخ پڕ دەکەین لێیان، لەبەر ئەوە ئیمان و باوەڕ ناهێنن (بەهۆی سەرسەختی و گوێ نەگرتنیانەوە).

(٨) بەراستی هەر دەڵێیت ئێمە کۆت و زنجیرمان کردۆتە گەردنیان و لەژێر چەناگەیان توندکراوە و بە ناچاری سەریان بەرز راگیراوە و ئەم لاولایان پێناکرێت و بەرپێی خۆیان نابینن.

(٩) هەروەها بەربەستمان لە بەردەمیانەوە و لە پشتیانەوە داناوە، پەردەشمان هێناوە بەسەر چاویاندا (مەبەست ئەو بەربەستانەشە کە لە دەروونیاندا هەیە و نایەڵێت رێگەی راست بدۆزنەوە) ئیتر ئەوانە حەق و راستی نابینن.

(١٠) ئەوانە چوونیەکە بۆیان، بێداریان بکەیتەوە یان بێداریان نەکەیتەوە، هەر باوەڕ ناهێنن.

(١١) بێگومان تۆ تەنها دەتوانیت ئەوانە بێدار بکەیتەوە کە شوێنی قورئان و بەرنامەی خوا کەوتوون، لە پەنهانیشدا لە خوا دەترسن، بەو هۆیەوە مژدەی لێخۆشبوون و پاداشتی بایەخدار و بەنرخ بدە بەو جۆرە کەسانە.

(١٢) بێگومان هەر ئێمە مردووەکان زیندوو دەکەینەوە، هەرچی کردوویانە و دەیکەن تۆماری دەکەین لەگەڵ ناسەوارەکانیشیاندا، هەموو شتێکمان لە کتێبێکی ناشکرادا (تۆمارگەی تایبەتیدا) بەووردی تۆمارو ئامار کردووە.

وَٱضۡرِبۡ لَهُم مَّثَلًا أَصۡحَٰبَ ٱلۡقَرۡيَةِ إِذۡ جَآءَهَا ٱلۡمُرۡسَلُونَ ﴿١٣﴾ إِذۡ أَرۡسَلۡنَآ إِلَيۡهِمُ ٱثۡنَيۡنِ فَكَذَّبُوهُمَا فَعَزَّزۡنَا بِثَالِثٖ فَقَالُوٓاْ إِنَّآ إِلَيۡكُم مُّرۡسَلُونَ ﴿١٤﴾ قَالُواْ مَآ أَنتُمۡ إِلَّا بَشَرٞ مِّثۡلُنَا وَمَآ أَنزَلَ ٱلرَّحۡمَٰنُ مِن شَيۡءٍ إِنۡ أَنتُمۡ إِلَّا تَكۡذِبُونَ ﴿١٥﴾ قَالُواْ رَبُّنَا يَعۡلَمُ إِنَّآ إِلَيۡكُمۡ لَمُرۡسَلُونَ ﴿١٦﴾ وَمَا عَلَيۡنَآ إِلَّا ٱلۡبَلَٰغُ ٱلۡمُبِينُ ﴿١٧﴾ قَالُوٓاْ إِنَّا تَطَيَّرۡنَا بِكُمۡۖ لَئِن لَّمۡ تَنتَهُواْ لَنَرۡجُمَنَّكُمۡ وَلَيَمَسَّنَّكُم مِّنَّا عَذَابٌ أَلِيمٞ ﴿١٨﴾ قَالُواْ طَٰٓئِرُكُم مَّعَكُمۡۚ أَئِن ذُكِّرۡتُمۚ بَلۡ أَنتُمۡ قَوۡمٞ مُّسۡرِفُونَ ﴿١٩﴾ وَجَآءَ مِنۡ أَقۡصَا ٱلۡمَدِينَةِ رَجُلٞ يَسۡعَىٰ قَالَ يَٰقَوۡمِ ٱتَّبِعُواْ ٱلۡمُرۡسَلِينَ ﴿٢٠﴾ ٱتَّبِعُواْ مَن لَّا يَسۡـَٔلُكُمۡ أَجۡرٗا وَهُم مُّهۡتَدُونَ ﴿٢١﴾ وَمَالِيَ لَآ أَعۡبُدُ ٱلَّذِي فَطَرَنِي وَإِلَيۡهِ تُرۡجَعُونَ ﴿٢٢﴾ ءَأَتَّخِذُ مِن دُونِهِۦٓ ءَالِهَةً إِن يُرِدۡنِ ٱلرَّحۡمَٰنُ بِضُرّٖ لَّا تُغۡنِ عَنِّي شَفَٰعَتُهُمۡ شَيۡـٔٗا وَلَا يُنقِذُونِ ﴿٢٣﴾ إِنِّيٓ إِذٗا لَّفِي ضَلَٰلٖ مُّبِينٍ ﴿٢٤﴾ إِنِّيٓ ءَامَنتُ بِرَبِّكُمۡ فَٱسۡمَعُونِ ﴿٢٥﴾ قِيلَ ٱدۡخُلِ ٱلۡجَنَّةَۖ قَالَ يَٰلَيۡتَ قَوۡمِي يَعۡلَمُونَ ﴿٢٦﴾ بِمَا غَفَرَ لِي رَبِّي وَجَعَلَنِي مِنَ ٱلۡمُكۡرَمِينَ ﴿٢٧﴾

(١٣) نموونەیان بۆ بهێنەرەوە بەخەڵکی شاری (انطاکیة) کاتێک دەستەیەک پێغەمبەریان بۆ هات.

(١٤) سەرەتا دووانمان بۆ رەوانە کردن، کەچی بروایان پێنەکردن، ئێمەش سێهەمێکمان بۆ پشتگیریان رەوانە کرد، هەموویان وتیان: ئێمە بێگومان بۆ لای ئێوە لەلایەن پەروەردگارەوە رەوانە کراوین.

(١٥) خەڵکەکە وتیان: ئێوە تەنها نادەمیزادێکن وەکو ئێمە، خوای میهرەبانیش هیچ شتێکی رەوانە نەکردووە، ئێوە هەر درۆ دەکەن.

(١٦) پێغەمبەرەکان وتیان: پەروەردگارمان خۆی چاک دەزانێت ئێمە بەڕاستی بۆ لای ئێوە رەوانە کراوین بە پێغەمبەرایەتی.

(١٧) تەنها ئەوەشمان لەسەرە کە بە روون و ئاشکرا پەیامی خواتان پێ رابگەیەنین.

(١٨) خەڵکەکە وتیان: ئێمە بەڕاستی بەهاتنتان تووشی نەگبەتی بووین، سوێند بەخوا ئەگەر واز نەهێنن و کۆڵ نەدەن، بەرد بارانتان دەکەین و لە لایەن ئێمەوە توشی ئازارێکی بە ئێش دەبن.

(١٩) پێغەمبەرەکان وتیان: ئێوە نەگبەتی و شوومیتان لەگەڵ خۆتاندایە (بەهۆی بێ باوەڕیتانەوە)، ئایا ئەگەر ئامۆژگاری و یادەوەری بکرێن ئەوە دەبێتە نەگبەتی و شووم بۆتان؟! نەخێر، وانییە، ئێوە هەر خۆتان قەوم و هۆزێکی سەرەڕۆن و لە گوناهدا رۆچوون بۆیە شووم و نەگبەتی یەخەی گرتوون.

(٢٠) ئەوسا لەوپەڕی شارەوە پیاوێکی ئیماندار بەپەلە، بە گورج و گۆڵی هات و وتی: ئەی قەوم و هۆزم ئەم پێغەمبەرانە راست دەکەن، ئەم فرستادانە راست دەڵێن شوێنیان بکەون، بروایان پێ بکەن، ئیمانیان پێ بهێنن...

(٢١) شوێنی ئەو کەسانە بکەون کە پاداشت و کرێتان لێ داوا ناکەن، ئەوانە هیدایەت دراون و لەسەر بەرنامەیەکی راست و دروستن.

(٢٢) دیارە خەڵکەکە کردویانە بە گاڵە، بۆیە پیاو چاکەکە وتوویەتی: جا ئەوە بۆچی من ئەو زاتە نەپەرستم کە بەدی هێناوم، ئێوەش خەڵکینە هەر بۆ لای ئەو دەبرێنەوە.

(٢٣) ئایا رەوایە لە جیاتی خوا چەند پەرستراوێکی تر بۆ خۆم بڕیار بدەم کە هیچیان بەدەست نیە خۆ ئەگەر خوای میهرەبان بیەوێت تووشی ناخۆشیەکم بکات، تکاو پاڕانەوەی ئەو پەرستراوانە هیچ سوودێکم پێ ناگەیەنن و فریام ناکەون و رزگارم ناکەن.

(٢٤) بێگومان من ئەگەر شتی وا بکەم ، ئەو کاتە من لە گومراییەکی ئاشکرا دەبم.

(٢٥) بەڕاستی من بڕیارم داوە کە ئیمان بە پەروەردگارتان بهێنم، با چاک گوێتان لێ بێت.

(٢٦) (دیارە، خوانەناسان پەلاماریان داوە و شەهیدیان کردووە) بۆیە پێی وتراوە: فەرموو بۆ ناو بەهەشت، لەوێشەوە هەر دڵسۆزانە وتویەتی: خۆزگە قەومەکەم بیانزانیایە سەرئەنجامی ئیمان چۆنە و کەوتوومەتە ناو چ ناز و نیعمەتێکەوە.

(٢٧) بەهۆی ئەوەوە کە پەروەردگارم لێم خۆشبووە و خستمیە ریزی رێزلێگیراوانەوە.



وَمَآ أَنزَلۡنَا عَلَىٰ قَوۡمِهِۦ مِنۢ بَعۡدِهِۦ مِن جُندٖ مِّنَ ٱلسَّمَآءِ وَمَا كُنَّا مُنزِلِينَ ﴿٢٨﴾ إِن كَانَتۡ إِلَّا صَيۡحَةٗ وَٰحِدَةٗ فَإِذَا هُمۡ خَٰمِدُونَ ﴿٢٩﴾ يَٰحَسۡرَةً عَلَى ٱلۡعِبَادِۚ مَا يَأۡتِيهِم مِّن رَّسُولٍ إِلَّا كَانُواْ بِهِۦ يَسۡتَهۡزِءُونَ ﴿٣٠﴾ أَلَمۡ يَرَوۡاْ كَمۡ أَهۡلَكۡنَا قَبۡلَهُم مِّنَ ٱلۡقُرُونِ أَنَّهُمۡ إِلَيۡهِمۡ لَا يَرۡجِعُونَ ﴿٣١﴾ وَإِن كُلّٞ لَّمَّا جَمِيعٞ لَّدَيۡنَا مُحۡضَرُونَ ﴿٣٢﴾ وَءَايَةٞ لَّهُمُ ٱلۡأَرۡضُ ٱلۡمَيۡتَةُ أَحۡيَيۡنَٰهَا وَأَخۡرَجۡنَا مِنۡهَا حَبّٗا فَمِنۡهُ يَأۡكُلُونَ ﴿٣٣﴾ وَجَعَلۡنَا فِيهَا جَنَّٰتٖ مِّن نَّخِيلٖ وَأَعۡنَٰبٖ وَفَجَّرۡنَا فِيهَا مِنَ ٱلۡعُيُونِ ﴿٣٤﴾ لِيَأۡكُلُواْ مِن ثَمَرِهِۦ وَمَا عَمِلَتۡهُ أَيۡدِيهِمۡۚ أَفَلَا يَشۡكُرُونَ ﴿٣٥﴾ سُبۡحَٰنَ ٱلَّذِي خَلَقَ ٱلۡأَزۡوَٰجَ كُلَّهَا مِمَّا تُنۢبِتُ ٱلۡأَرۡضُ وَمِنۡ أَنفُسِهِمۡ وَمِمَّا لَا يَعۡلَمُونَ ﴿٣٦﴾ وَءَايَةٞ لَّهُمُ ٱلَّيۡلُ نَسۡلَخُ مِنۡهُ ٱلنَّهَارَ فَإِذَا هُم مُّظۡلِمُونَ ﴿٣٧﴾ وَٱلشَّمۡسُ تَجۡرِي لِمُسۡتَقَرّٖ لَّهَاۚ ذَٰلِكَ تَقۡدِيرُ ٱلۡعَزِيزِ ٱلۡعَلِيمِ ﴿٣٨﴾ وَٱلۡقَمَرَ قَدَّرۡنَٰهُ مَنَازِلَ حَتَّىٰ عَادَ كَٱلۡعُرۡجُونِ ٱلۡقَدِيمِ ﴿٣٩﴾ لَا ٱلشَّمۡسُ يَنۢبَغِي لَهَآ أَن تُدۡرِكَ ٱلۡقَمَرَ وَلَا ٱلَّيۡلُ سَابِقُ ٱلنَّهَارِۚ وَكُلّٞ فِي فَلَكٖ يَسۡبَحُونَ ﴿٤٠﴾

(٢٨) خوا دەفەرموێت: وەنەبێت هیچ لەشکرێکمان لە ئاسمانەوە ناردبێتە خوارەوە بۆ سەر هۆزەکەی دوای شەهیدکردنی، وەنەبێت هیچ لەشکرێکمان رەوانە کردبێت بۆ لەناوبردنیان.

(٢٩) بەڵکو تەنها یەک دەنگی گەورەو شریخەیەکی بەهێز نەبێت هیچی تر نەبوو، جا ئەوان دەستبەجێ مردن خامۆش بوون.

(٣٠) پەشیمانی و داخ و ناڵە دابارێتە سەر ئەو بەندانە، هیچ پێغەمبەرێکیان بۆ نایەت کە ئەوان گاڵتەی پێنەکەن.

(٣١) ئایا ئەوە سەرنجیان نەداوە چەندەها هۆزی پێش ئەمانمان لەناو بردووە، خۆ هەرگیز ناگەڕێنەوە ناویان و ناگەڕێنەوە بۆ دنیا.

(٣٢) کەسیان نیيە لەو لەناو براوانە کە لای ئێمە بە کۆمەڵ ئامادەی لێپرسینەوە نەکرێن.

(٣٣) لە بەڵگە و نیشانەی ئاشکرای خوا بۆ ئەو خەڵکە: زەوی مردووە کە بەهۆی ئاوی بارانەوە زیندووی دەکەینەوە، دانەوێڵەی لێ پەیدا دەکەین کە لێی دەخۆن.

(٣٤) هەروەها جۆرەها باخاتی لێ بەرهەم دەهێنین، لە دارخورما و چەند جۆر ترێ، هەروەها چەندەها کانیاویشمان تیادا هەڵقوڵاندووە...

(٣٥) بۆ ئەوەی لە بەروبوومەکەی بخۆن، لەوەش کە بە دەستی خۆیان لەو بەرو بوومانە دروستی دەکەن (وەکو دۆشاو و سرکە و شەربەت و... هەروەها جێگەی تێڕامانە کە: ئادەمیزاد ورد بێتەوە لە دانە دانەی ئەو بەروبوومانە؛ چۆن پێچراونەتەوە، قەبارەیان، رەنگیان، بۆنیان، تامیان...هتد) ئایا لە بەرامبەر ئەو هەموو نازو نیعمەتانەوە سوپاسگوزاری ناکەن؟!

(٣٦) پاکی و بێگەردی بۆ ئەو زاتەی هەر هەموو بەدیهێنراوەکانی بەجووت دروست کردووە لەوەی لە زەویدا دەڕوێت، لە خۆیشیان، لەو شتانەش کە نایزانن (لە سەردەمی عیلم و زانستیدا روون بۆتەوە: کە هەموو بەدیهێنراوان ـ مادی و مەعنەوی ـ جووتن).

(٣٧) هەروەها بەڵگەو نیشانەیەکی ئاشکرای تر بۆیان، شەوە، کە پۆشاکی رووناکی رۆژی لەبەر دادەماڵین، بەو هۆیەوە دنیایان لێ تاریک دەبێت.

(٣٨) خۆریش لە گەردش و سوڕانەوەی خۆیدا بەردەوامە و بەرەو سرەوت دەچێت، یاخود بە دەوری چەقی خۆیدا دەسوڕێتەوە، بێگومان ئەوە توانای زاتێکی باڵادەست و زانا دەردەخات (کە هەموو شتێکی بە رێکوپێکی دروست کردووە).

(٣٩) هەروەها کات و شوێنی هەڵهاتنی مانگیشمان دیاری کردووە (هەر شەوێک لەکاتێکی دیاریکراو و شوێنێکی دیاریکراودا هەڵدێت، رادەی ئەو روناکیەش کە دەکەوێتە سەری جیاوازە، هەتا (سەرئەنجام هەموو مانگێک لە رواڵەتدا) وەک چیلکەیەکی وشکی باریک دەنوێنێت.

(٤٠) نە خۆر بۆی هەیە بە مانگ بگات (لە هێڵ و رێڕەوی خۆی دەربچێت)، نە شەویش پێش رۆژ دەکەوێت، بەڵکو هەریەکەیان لە خولگەی تایبەتی خۆیاندا مەلە دەکەن و بە ئاسانی دەسوڕێنەوە.

وَءَايَةٌ لَّهُمْ أَنَّا حَمَلْنَا ذُرِّيَّتَهُمْ فِي ٱلْفُلْكِ ٱلْمَشْحُونِ ﴿٤١﴾ وَخَلَقْنَا لَهُم مِّن مِّثْلِهِۦ مَا يَرْكَبُونَ ﴿٤٢﴾ وَإِن نَّشَأْ نُغْرِقْهُمْ فَلَا صَرِيخَ لَهُمْ وَلَا هُمْ يُنقَذُونَ ﴿٤٣﴾ إِلَّا رَحْمَةً مِّنَّا وَمَتَٰعًا إِلَىٰ حِينٍ ﴿٤٤﴾ وَإِذَا قِيلَ لَهُمُ ٱتَّقُوا۟ مَا بَيْنَ أَيْدِيكُمْ وَمَا خَلْفَكُمْ لَعَلَّكُمْ تُرْحَمُونَ ﴿٤٥﴾ وَمَا تَأْتِيهِم مِّنْ ءَايَةٍ مِّنْ ءَايَٰتِ رَبِّهِمْ إِلَّا كَانُوا۟ عَنْهَا مُعْرِضِينَ ﴿٤٦﴾ وَإِذَا قِيلَ لَهُمْ أَنفِقُوا۟ مِمَّا رَزَقَكُمُ ٱللَّهُ قَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ لِلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ أَنُطْعِمُ مَن لَّوْ يَشَآءُ ٱللَّهُ أَطْعَمَهُۥٓ إِنْ أَنتُمْ إِلَّا فِي ضَلَٰلٍ مُّبِينٍ ﴿٤٧﴾ وَيَقُولُونَ مَتَىٰ هَٰذَا ٱلْوَعْدُ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ ﴿٤٨﴾ مَا يَنظُرُونَ إِلَّا صَيْحَةً وَٰحِدَةً تَأْخُذُهُمْ وَهُمْ يَخِصِّمُونَ ﴿٤٩﴾ فَلَا يَسْتَطِيعُونَ تَوْصِيَةً وَلَآ إِلَىٰٓ أَهْلِهِمْ يَرْجِعُونَ ﴿٥٠﴾ وَنُفِخَ فِي ٱلصُّورِ فَإِذَا هُم مِّنَ ٱلْأَجْدَاثِ إِلَىٰ رَبِّهِمْ يَنسِلُونَ ﴿٥١﴾ قَالُوا۟ يَٰوَيْلَنَا مَنۢ بَعَثَنَا مِن مَّرْقَدِنَا ۜ هَٰذَا مَا وَعَدَ ٱلرَّحْمَٰنُ وَصَدَقَ ٱلْمُرْسَلُونَ ﴿٥٢﴾ إِن كَانَتْ إِلَّا صَيْحَةً وَٰحِدَةً فَإِذَا هُمْ جَمِيعٌ لَّدَيْنَا مُحْضَرُونَ ﴿٥٣﴾ فَٱلْيَوْمَ لَا تُظْلَمُ نَفْسٌ شَيْـًٔا وَلَا تُجْزَوْنَ إِلَّا مَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴿٥٤﴾

سكتة لطيفة على الألف

(٤١) بەڵگە و نیشانەیەکی تر لە هێزو دەسەڵاتمان بۆیان، ئەوەیە کە بەراستی ئێمە نەوەکانیانمان لە کەشتیەکەدا هەڵگرت (مەبەست کەشتی ـ نوح ـ ە کە بە باپیرە گەورەی دووهەمی ئادەمیزاد دەدرێتە قەڵەم).

(٤٢) هەروەها کەشتی و هۆکاری تری هاتوچۆی لە وێنەی ئەو بۆ سازاندوون، (کە هۆکارەکانی گواستنەوەی ئاسمانی و زەمینی و دەریایی دەگرێتەوە، چونکە هەر خوا بەدیهێنەری ئادەمیزاد و مادەی خاو و سوتەمەنی و..هتد).

(٤٣) خۆ ئەگەر بمانەوێت نوقمیان دەکەین، ئەو کاتە کەس نیـیە بێت بە هاواریانەوە و رزگاریش ناکرێن لە مردن ...

(٤٤) مەگەر رەحمەت و میهرەبانی ئێمە مۆڵەتیان بدات تا ماوەیەکی دیاریکراو بەهرە لە ژیان وەربگرن.

(٤٥) کاتێکیش بەبێ باوەڕان بوترێت: خۆتان لەو سزایە بپارێزن کە بەسەر گەلانی پێشوودا هات، هەروەها لە سزای داهاتووتان، بۆ ئەوەی رەحمتان پێ بکرێت، (کەچی هەر پاکیان نیە).

(٤٦) هیچ ئایەت و بەڵگە و نیشانەیەکیان لە ئایەت و بەڵگەکانی پەروەردگاریان بۆ نایەت کە پشتی تێ نەکەن و رووی لێوەرنەگێڕن .

(٤٧) کاتێکیش پێیان بوترێت ببەخشن لەوەی کە خوا پێی بەخشیون، ئەوانەی بێ‌باوەڕ بوون بەوانە دەڵێن کە باوەڕیان هێناوە: ئایا ئێمە خواردن بدەین بە کەسێک ئەگەر خوا بیویستایە خۆراکی پێ دەبەخشی؟ ئێوە هەر لە گومڕایی و سەرلێشێواوییەکی ئاشکرادا گیرتان خواردووە!!

(٤٨) بێ‌باوەڕان: بە گومانەوە روو بە ئیمانداران دەڵێن: باشە؛ ئەگەر قیامەت و لێپرسینەوە راستە، کەی ئەو کاتە دێت ئەگەر راست دەکەن؟!

(٤٩) ئەوانە تەنها چاوەڕێی یەک شریخە و دەنگێکی زۆر گەورەی سامناک نەبێت چاوەڕێی هیچی تر ناکەن، کە هەموویان دەپێچێتەوە (کۆتایی بە ژیانیان دەهێنێت) لەکاتێکدا کە سەرگەرمی کاروباری دنیای خۆیانن، سەرگەمی کێشە و بەربەرەکانێی ناحەقن.

(٥٠) ئەوسا ئیتر نە دەتوانن راسپاردەیەک بگەیەنن، نە دەتوانن بگەڕێنەوە بۆ ناو ماڵ و منداڵیان (چونکە هەموویان لەناوچوون، هەموویان خامۆش بوون).

(٥١) پاشان هەر کە فوو دەکرێت بە ـ صور ـ دا، دەستبەجێ خێرا هەموویان لە گۆڕەکانیان لە توێی خاکەوە بەپەلە دێنە دەرەوە بۆ لای پەروەردگاریان (کەس ناتوانێت سەرپێچی بکات، یان خۆی بدزێتەوە).

(٥٢) بە سەرسامیەکی زۆرەوە دەڵێن: ئەی هاوار ئەوە کێ ئێمەی زیندوو کردەوە؟ کێ ئێمەی لە شوێنی راکشانمان لە گۆڕەکانمان دەرهێنا؟ (ئەوسا ئیمانداران، یان فریشتەکان یان خوای گەورە خۆی دەفەرموێت): ئا ئەمە بەڵێنی خوای میهرەبانە و پێغەمبەرانیش لە هەواڵدانی ئەو رۆژە راستیان کردووە.

(٥٣) لەوماوەیەدا هیچ روونادات جگەلە دەنگێکی گەورەی کوتوپڕ نەبێت، جادەستبەجێ هەموویان لای ئێمە ئامادە کراون.

(٥٤) ئینجا ئەم جارە دەدرێت: ئەمڕۆ هیچ کەس ستەمی لێ ناکرێت بەهیچ شێوەیەک، خەڵکینە دڵنیابن کە: تەنها پاداشتی کارێک دەدرێنەوە کە دەتانکرد.



إِنَّ أَصْحَٰبَ ٱلْجَنَّةِ ٱلْيَوْمَ فِى شُغُلٍ فَٰكِهُونَ ﴿٥٥﴾ هُمْ وَأَزْوَٰجُهُمْ فِى ظِلَٰلٍ عَلَى ٱلْأَرَآئِكِ مُتَّكِـُٔونَ ﴿٥٦﴾ لَهُمْ فِيهَا فَٰكِهَةٌ وَلَهُم مَّا يَدَّعُونَ ﴿٥٧﴾ سَلَٰمٌ قَوْلًا مِّن رَّبٍّ رَّحِيمٍ ﴿٥٨﴾ وَٱمْتَٰزُوا۟ ٱلْيَوْمَ أَيُّهَا ٱلْمُجْرِمُونَ ﴿٥٩﴾ ۞ أَلَمْ أَعْهَدْ إِلَيْكُمْ يَٰبَنِىٓ ءَادَمَ أَن لَّا تَعْبُدُوا۟ ٱلشَّيْطَٰنَ ۖ إِنَّهُۥ لَكُمْ عَدُوٌّ مُّبِينٌ ﴿٦٠﴾ وَأَنِ ٱعْبُدُونِى ۚ هَٰذَا صِرَٰطٌ مُّسْتَقِيمٌ ﴿٦١﴾ وَلَقَدْ أَضَلَّ مِنكُمْ جِبِلًّا كَثِيرًا ۖ أَفَلَمْ تَكُونُوا۟ تَعْقِلُونَ ﴿٦٢﴾ هَٰذِهِۦ جَهَنَّمُ ٱلَّتِى كُنتُمْ تُوعَدُونَ ﴿٦٣﴾ ٱصْلَوْهَا ٱلْيَوْمَ بِمَا كُنتُمْ تَكْفُرُونَ ﴿٦٤﴾ ٱلْيَوْمَ نَخْتِمُ عَلَىٰٓ أَفْوَٰهِهِمْ وَتُكَلِّمُنَآ أَيْدِيهِمْ وَتَشْهَدُ أَرْجُلُهُم بِمَا كَانُوا۟ يَكْسِبُونَ ﴿٦٥﴾ وَلَوْ نَشَآءُ لَطَمَسْنَا عَلَىٰٓ أَعْيُنِهِمْ فَٱسْتَبَقُوا۟ ٱلصِّرَٰطَ فَأَنَّىٰ يُبْصِرُونَ ﴿٦٦﴾ وَلَوْ نَشَآءُ لَمَسَخْنَٰهُمْ عَلَىٰ مَكَانَتِهِمْ فَمَا ٱسْتَطَٰعُوا۟ مُضِيًّا وَلَا يَرْجِعُونَ ﴿٦٧﴾ وَمَن نُّعَمِّرْهُ نُنَكِّسْهُ فِى ٱلْخَلْقِ ۖ أَفَلَا يَعْقِلُونَ ﴿٦٨﴾ وَمَا عَلَّمْنَٰهُ ٱلشِّعْرَ وَمَا يَنۢبَغِى لَهُۥٓ ۚ إِنْ هُوَ إِلَّا ذِكْرٌ وَقُرْءَانٌ مُّبِينٌ ﴿٦٩﴾ لِّيُنذِرَ مَن كَانَ حَيًّا وَيَحِقَّ ٱلْقَوْلُ عَلَى ٱلْكَٰفِرِينَ ﴿٧٠﴾

(٥٥) بەڕاستی ئەمڕۆ بەهەشتیەکان لەناو خۆشی و شادی و کامەرانیەکی بێ وێنەدا سەرگەرمن.

(٥٦) خۆیان وهاوسەرانیان لە ژێرسێبەری درەختی جوان و چڕوپڕدا لەسەر کورسی و قەنەفە رازاوەکان شانیان داداوە.

(٥٧) میوەهاتی زۆرو جۆراو جۆریان لەوێدا پێشکەش دەکرێت، هەروەها هەرچی داوای بکەن و حەزی لێ بکەن دەستبەجێ ئامادەیە (لە خواردن و خواردنەوە، لە جل و بەرگی جوان، لە جێگە و رێگەی خۆش، لە هۆکاری هاتوچۆ، لە هەزاران نازو نیعمەتی بێشومار).

(٥٨) هاورێ لەگەڵ سڵاو و رێزدا لەلایەن پەروەردگاری میهرەبان و دلۆڤانەوە.

(٥٩) لەولاشەوە یاخیەکان پێیان دەوترێت: ئادەی تاوانبارو گوناهکاران، جیاببنەوە.

(٦٠) ئەوسا خوای گەورە گلەیی لە یاخیەکانی نەوەی ئادەم دەکات و دەفەرموێت: ئەی نەوەی ئادەم؛ مەگەر من پێم ڕانەگەیاندن کە شەیتان نەپەرستن؛ چونکە ئەوبەراستی دوژمنی ئاشکراتانە.

(٦١) بەڵکو تەنها من بپەرستن کە هەر ئەمەیە رێگە و رێبازی راست و دروست.

(٦٢) بێگومان شەیتان خەڵکێکی زۆری لە ئێوە گومڕاکرد، جا ئایا بۆچی ژیر نەبوون.

(٦٣) ئەمە ئەو دۆزەخەیە کە جاران پێی دەترسێنران.

(٦٤) دەبێت ئەمڕۆ بگەیەنرێنە ناوی لە سەرەنجامی بێباوەڕیتاندا و ببرژێن تیایدا بەهۆی ئەوەی کە باوەڕتان پێی نەبوو.

(٦٥) ئەمڕۆ مۆر دەنێین بەدەمیاندا و قسەیان بۆ ناکرێت، بەڵکو دەستیان قسەمان بۆ دەکات، قاچیشیان شایەتی دەدات بەو کاروکردەوانە کە ئەنجامیان دەدا (دەربارەی ئەو تاوانانەی کە ئەنجامیان داوە، کاتێک شریتی کاسێت و ڤیدیۆ و سی دی و دیسک قسەمان بۆ دەکەن باوەڕ بوون بەقسەکردنی دەست و قاچ و ...هتد، ئاسانە).

(٦٦) خوانەناسان بۆ بیرێک ناکەنەوە خۆ ئەگەر بمانەوێت چاویان کوێر دەکەین و شوێنەواری نایەڵین، ئەو کاتە ئەگەر بیانەوێت بە رێگاکەدا برۆن، چۆن دەتوانن رێگەکە ببینن و پێشبڕکێ بکەن؟!.

(٦٧) یاخود ئەگەر بمانەوێت هەر لە جێگەی خۆیان (لەو جێگەدا کە تاوانی تیادا ئەنجام دەدەن) گۆج و ئیفلیجیان دەکەین، یان رووخساریان دەخەینە شێوەی ئاژەڵ وجانەوەرەوە، ئەوسا ئیتر ناتوانن نە بەرەو پێش بچن، نە بگەڕێنەوە دواوە.

(٦٨) خۆ ئاشکرایە ئەوەی تەمەنی درێژی پێ ببەخشین، جوانی رواڵەتی بۆ ناهێڵین، جا ئایا بۆ ژیریان ناخەنە کار؟!

(٦٩) (دیارە خوانەناسان ئایەتەکانی قورئانیان بە شیعر داوەتە قەڵەم و پێغەمبەریش ﷺ بەشاعیر، بۆیە دەفەرموێت): وەنەبێت شیعرمان فێر کردبێت، شیعر وتنیش لەو قەدەغەیە، ئەوەی کە فێرمان کردووە تەنها یادخەرەوەو قورئانێکی ئاشکراو روونە.

(٧٠) ئەم قورئانە بۆ ئەوەیە ئەو کەسانە بێداربکاتەوە کە زیندوون (دڵ و عەقڵیان زیندوو هوشیارە) تا بڕیاری خوا لەسەر کافران جێبەجێ بکرێت (بڕیاری سەرگەردانی دنیا و سزای قیامەت، ئەگەر باوەڕی پێ نەکەن).

أَوَلَمْ يَرَوْا أَنَّا خَلَقْنَا لَهُم مِّمَّا عَمِلَتْ أَيْدِينَا أَنْعَامًا فَهُمْ لَهَا مَالِكُونَ ﴿٧١﴾ وَذَلَّلْنَاهَا لَهُمْ فَمِنْهَا رَكُوبُهُمْ وَمِنْهَا يَأْكُلُونَ ﴿٧٢﴾ وَلَهُمْ فِيهَا مَنَافِعُ وَمَشَارِبُ أَفَلَا يَشْكُرُونَ ﴿٧٣﴾ وَاتَّخَذُوا مِن دُونِ اللَّهِ آلِهَةً لَّعَلَّهُمْ يُنصَرُونَ ﴿٧٤﴾ لَا يَسْتَطِيعُونَ نَصْرَهُمْ وَهُمْ لَهُمْ جُندٌ مُّحْضَرُونَ ﴿٧٥﴾ فَلَا يَحْزُنكَ قَوْلُهُمْ إِنَّا نَعْلَمُ مَا يُسِرُّونَ وَمَا يُعْلِنُونَ ﴿٧٦﴾ أَوَلَمْ يَرَ الْإِنسَانُ أَنَّا خَلَقْنَاهُ مِن نُّطْفَةٍ فَإِذَا هُوَ خَصِيمٌ مُّبِينٌ ﴿٧٧﴾ وَضَرَبَ لَنَا مَثَلًا وَنَسِيَ خَلْقَهُ قَالَ مَن يُحْيِي الْعِظَامَ وَهِيَ رَمِيمٌ ﴿٧٨﴾ قُلْ يُحْيِيهَا الَّذِي أَنشَأَهَا أَوَّلَ مَرَّةٍ وَهُوَ بِكُلِّ خَلْقٍ عَلِيمٌ ﴿٧٩﴾ الَّذِي جَعَلَ لَكُم مِّنَ الشَّجَرِ الْأَخْضَرِ نَارًا فَإِذَا أَنتُم مِّنْهُ تُوقِدُونَ ﴿٨٠﴾ أَوَلَيْسَ الَّذِي خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ بِقَادِرٍ عَلَىٰ أَن يَخْلُقَ مِثْلَهُم بَلَىٰ وَهُوَ الْخَلَّاقُ الْعَلِيمُ ﴿٨١﴾ إِنَّمَا أَمْرُهُ إِذَا أَرَادَ شَيْئًا أَن يَقُولَ لَهُ كُن فَيَكُونُ ﴿٨٢﴾ فَسُبْحَانَ الَّذِي بِيَدِهِ مَلَكُوتُ كُلِّ شَيْءٍ وَإِلَيْهِ تُرْجَعُونَ ﴿٨٣﴾

سُورَةُ الصَّافَّاتِ

(٧١) باشە ئەو خەڵکە سەرنجیان نەداوە کە بەراستی بە دەسەڵاتی خۆمان ماڵاتمان بۆ دروست کردوون و ئەوان بوون بە خاوەنی؟

(٧٢) ئینجا ئەو ماڵاتەمان رام هێناوە بۆیان، هەندێکی بۆ سواری بەکار دەهێنن، لە گۆشتی هەندێکیشیان دەخۆن.

(٧٣) هەروەها سوود و قازانجی زۆریان لێ دەبینن (جگە لەوانەی باسکرا، بۆ زەوی کێلان و ئاو هێنان،...) شیرەکەی دەخۆنەوە (جۆرەها خۆراکی تری لێ دروست دەکەن) جا ئایا ئەوە بۆ سوپاسی خوای بەخشندە ناکەن لەسەری؟!

(٧٤) سەرەڕای ئەم هەموو ناز و نیعمەتە ئاشکرایە، نەفامان: لە جیاتی خواپەرستیی، بت و شتی تر دەپەرستن و بۆ ئەوەی لە تەنگانەدا کۆمەکی بکرێنو سەربخرێن.

(٧٥) بەڵام ناتوانن سەریان بخەن بەڵکو هەر ئەمان بوونەتە سەرباز و پاسەوان بۆ بتەکان و هەمیشە لە خزمەتیاندا ئامادە کراون.

(٧٦) ئەی محمد ﷺ قسە و گوفتاری ئەوانە غەمبارت نەکات، چونکە بەراستی ئێمە ئاگاداری ئەوەین کە دەیشارنەوە و ئەوەش ئاشکرای دەکەن.

(٧٧) ئایا ئادەمیزاد سەرنجی نەداوە کە: ئێمە بێگومان دروستمان کردووە لە نوتفەیەک، کەچی خێرا بووەتە دوژمنێکی ئاشکراو دژایەتیمان دەکات؟!

(٧٨) نموونەی لاوازیی وبێدەسەڵاتی بۆ ئێمە هێناوەتەوە و بەدیهاتنی خۆی لە بیر کردووە، دەیوت: کێ ئەم ئێسکانە زیندوو دەکاتەوە لە کاتێکدا کە رزیوو و پرتوکاون ؟!

(٧٩) پێیان بڵێ: ئەو زاتەی کە یەکەمجار دروستی کرد، هەر ئەویش زیندووی دەکاتەوە، ئەو بەهەموو دروستکراوێک زانا و ئاگایە(دروستکردن و دروستکردنەوەی هەموو شتێکی لا ئاسانە)...

(٨٠) ئەو زاتەی کە لە درەختی سەوز ئاگرتان بۆ بەدی دەهێنێت، ئیتر ئێوە دایدەگیرسێنن.

(٨١) ئایا ئەو زاتەی کە ئاسمانەکان و زەوی دروست کردووە ناتوانێت دووبارە وەک خۆیان دروستیان بکاتەوە؟! بەڵێ (زۆر چاک دەتوانێت)، چونکە ئەوزاتە لە دروستکردن و داهێناندا بە توانا و زانایە.

(٨٢) بێگومان هەر کاتێک فەرمانی خوا دەرچوو، ویستی شتێک جێبەجێ بکات و بیهێنێتە دی، پێی دەڵێت ببە، ئەویش دەستبەجێ و بێ دواکەوتن پێش دێت و ئەنجام دەدرێت و دروست دەبێت.

(٨٣) پاکی و بێگەردی بۆ ئەو زاتەی جڵەوی هەموو شتێکی بەدەستە، هەر بۆ لای ئەویش دەبرێنەوە.

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

وَٱلصَّٰٓفَّٰتِ صَفًّا ﴿١﴾ فَٱلزَّٰجِرَٰتِ زَجْرًا ﴿٢﴾ فَٱلتَّٰلِيَٰتِ ذِكْرًا ﴿٣﴾ إِنَّ إِلَٰهَكُمْ لَوَٰحِدٌ ﴿٤﴾ رَّبُّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَمَا بَيْنَهُمَا وَرَبُّ ٱلْمَشَٰرِقِ ﴿٥﴾ إِنَّا زَيَّنَّا ٱلسَّمَآءَ ٱلدُّنْيَا بِزِينَةٍ ٱلْكَوَاكِبِ ﴿٦﴾ وَحِفْظًا مِّن كُلِّ شَيْطَٰنٍ مَّارِدٍ ﴿٧﴾ لَّا يَسَّمَّعُونَ إِلَى ٱلْمَلَإِ ٱلْأَعْلَىٰ وَيُقْذَفُونَ مِن كُلِّ جَانِبٍ ﴿٨﴾ دُحُورًا وَلَهُمْ عَذَابٌ وَاصِبٌ ﴿٩﴾ إِلَّا مَنْ خَطِفَ ٱلْخَطْفَةَ فَأَتْبَعَهُۥ شِهَابٌ ثَاقِبٌ ﴿١٠﴾ فَٱسْتَفْتِهِمْ أَهُمْ أَشَدُّ خَلْقًا أَم مَّنْ خَلَقْنَآ إِنَّا خَلَقْنَٰهُم مِّن طِينٍ لَّازِبٍ ﴿١١﴾ بَلْ عَجِبْتَ وَيَسْخَرُونَ ﴿١٢﴾ وَإِذَا ذُكِّرُوا۟ لَا يَذْكُرُونَ ﴿١٣﴾ وَإِذَا رَأَوْا۟ ءَايَةً يَسْتَسْخِرُونَ ﴿١٤﴾ وَقَالُوٓا۟ إِنْ هَٰذَآ إِلَّا سِحْرٌ مُّبِينٌ ﴿١٥﴾ أَءِذَا مِتْنَا وَكُنَّا تُرَابًا وَعِظَٰمًا أَءِنَّا لَمَبْعُوثُونَ ﴿١٦﴾ أَوَءَابَآؤُنَا ٱلْأَوَّلُونَ ﴿١٧﴾ قُلْ نَعَمْ وَأَنتُمْ دَٰخِرُونَ ﴿١٨﴾ فَإِنَّمَا هِىَ زَجْرَةٌ وَٰحِدَةٌ فَإِذَا هُمْ يَنظُرُونَ ﴿١٩﴾ وَقَالُوا۟ يَٰوَيْلَنَا هَٰذَا يَوْمُ ٱلدِّينِ ﴿٢٠﴾ هَٰذَا يَوْمُ ٱلْفَصْلِ ٱلَّذِى كُنتُم بِهِۦ تُكَذِّبُونَ ﴿٢١﴾ ۞ ٱحْشُرُوا۟ ٱلَّذِينَ ظَلَمُوا۟ وَأَزْوَٰجَهُمْ وَمَا كَانُوا۟ يَعْبُدُونَ ﴿٢٢﴾ مِن دُونِ ٱللَّهِ فَٱهْدُوهُمْ إِلَىٰ صِرَٰطِ ٱلْجَحِيمِ ﴿٢٣﴾ وَقِفُوهُمْ إِنَّهُم مَّسْـُٔولُونَ ﴿٢٤﴾



سورەتی (الصافات)

بەناوی خوای بەخشندە و میهرەبان

(١) سوێند بە فریشتە ریز بووەکان.

(٢) بەو فریشتانەیش کە دەخورن بەسەر ستەمکاراندا (لە سەرەمەرگ و لە قیامەت و دۆزەخدا).

(٣) بەوانەش کە پەیامە ئاسمانیەکان دەگەیەنن بە پێغەمبەران و بەسەریاندا دەیخوێننەوە.

(٤) بەراستی خوای ئێوە تاکە و یەکێکە.

(٥) پەروەردگاری ئاسمانەکان و زەوی و نێوانیانە، پەروەردگاری رۆژهەڵاتەکانیشە.

(٦) بێگومان ئێمە ئاسمانی دنیامان رازاندۆتەوە بە جوانی و رۆشنی ئەستێرە و هەسارەکان.

(٧) ئاسمانمان پاراستووە لە پیلان و شەڕی هەموو شەیتانێکی سەرکەش.

(٨) شەیتانەکان ناتوانن هەواڵی ئەو نەخشە و بەرنامانەی کە بە فریشتە پایە بڵندەکان دەسپێردرێت، بیزانن و بیبیستن، چونکە لە هەموو لایەکەوە پارچە ئەستێرەیان بۆ دەهاوێژرێت.

(٩) بۆ ئەوەی تێکبشکێنرێن و راو بنرێن، سزای سەخت و بەردەوام لە قیامەتدا بۆیان ئامادەیە.

(١٠) مەگەر ئەوەیان کە هەواڵێک بفرێنێت و بیەوێت بۆی دەربچێت، ئەوە ئەستێرەیەکی رووناک شوێنی دەکەوێت و لەناوی دەبات.

(١١) ئەی پێغەمبەر ﷺ لە بێباوەڕان بپرسە: ئایا ئەوان گرنگتر و گەورەتر و بەهێزترن یان ئەو شتانەی تر کە دروستمان کردووە وەک (ئاسمان و زەوی و کێوەکان...هتد)، بێگومان ئێمە ئەوانمان لە قوڕێکی مچ دروست کردووە (کە یەکێکە لە قۆناغەکانی دروستکردنی باوکە ئادەم).

(١٢) نەخێر (سەیرە) تۆ سەرسامی لە بێباوەڕیی کافران کەچی ئەوان گاڵتە دەکەن بەو هەموو بەڵگە بەهێزانە.

(١٣) کاتێکیش ئامۆژگاری بکرێن ئامۆژگاری وەرناگرن و سەر بادەدەن.

(١٤) کاتێک بەڵگە و موعجیزەیەک دەبینن دەیکەنە گاڵتەجاڕ و باوەڕ ناکەن.

(١٥) دەشیانوت: ئەمەی ئێمە دەیبینین و دەیبیسین جگە لە جادوویەکی ئاشکرا شتێکی تر نیە..!!

(١٦) هەروەها دەڵێن : ئایا کاتێک مردین و بووینە خاک و ئێسک، ئایا ئێمە زیندوو دەکرێینەوە؟!

(١٧) ئایا باوانی دێرینیشمان زیندوو دەکرێتەوە؟

(١٨) لە وەڵامیاندا ئەی پێغەمبەر ﷺ بڵێ: بەڵێ، لەکاتێکدا کە ئێوە زەلیل و ملکەچن .

(١٩) جا بێگومان تەنها داچڵەکاندن و تێخوڕین و دەنگێکی بەهێزە دەستبەجێ هەموویان هەستاون و تەماشا دەکەن.

(٢٠) ئەوسا دەڵێن: ئەی هاوار، ئاخ و ئۆف بۆ ئێمە، ئەمە ئیتر رۆژی قیامەت و لێپرسینەوەیە.

(٢١) ئینجا بە هەڕەشەوە پێیان دەوترێت ئەمە رۆژی جیاکردنەوەیە کە ئێوە بڕواتان پێی نەبوو، بە درۆتان دەزانی.

(٢٢) خوای گەورە فەرماندەدا بە فریشتەکان هەموو ئەوانەی ستەمیان کردووە کۆیان بکەنەوە، خۆیان و هاوسەرانیان، خۆیان و هاوشێوەیان و ئەو شتانەش کە دەیانپەرست .....

(٢٣) لە جیاتی خوا، ئینجا رێنماییان بکەن بۆ رێگەی دۆزەخ، چونکە بێباوەڕ و تاوانبارن.

(٢٤) لەکاتی راپێچ کردنیاندا فەرمان دەدرێت: ئادەی بیانوەستێنن، بێگومان ئەوان پرسیار لێکراون.

مَا لَكُمْ لَا تَنَاصَرُونَ ﴿٢٥﴾ بَلْ هُمُ الْيَوْمَ مُسْتَسْلِمُونَ ﴿٢٦﴾ وَأَقْبَلَ بَعْضُهُمْ
عَلَىٰ بَعْضٍ يَتَسَاءَلُونَ ﴿٢٧﴾ قَالُوا إِنَّكُمْ كُنتُمْ تَأْتُونَنَا عَنِ الْيَمِينِ ﴿٢٨﴾
قَالُوا بَل لَّمْ تَكُونُوا مُؤْمِنِينَ ﴿٢٩﴾ وَمَا كَانَ لَنَا عَلَيْكُم مِّن سُلْطَانٍ
بَلْ كُنتُمْ قَوْمًا طَاغِينَ ﴿٣٠﴾ فَحَقَّ عَلَيْنَا قَوْلُ رَبِّنَا إِنَّا لَذَائِقُونَ ﴿٣١﴾
فَأَغْوَيْنَاكُمْ إِنَّا كُنَّا غَاوِينَ ﴿٣٢﴾ فَإِنَّهُمْ يَوْمَئِذٍ فِي الْعَذَابِ مُشْتَرِكُونَ
﴿٣٣﴾ إِنَّا كَذَٰلِكَ نَفْعَلُ بِالْمُجْرِمِينَ ﴿٣٤﴾ إِنَّهُمْ كَانُوا إِذَا قِيلَ لَهُمْ
لَا إِلَٰهَ إِلَّا اللَّهُ يَسْتَكْبِرُونَ ﴿٣٥﴾ وَيَقُولُونَ أَئِنَّا لَتَارِكُو آلِهَتِنَا
لِشَاعِرٍ مَّجْنُونٍ ﴿٣٦﴾ بَلْ جَاءَ بِالْحَقِّ وَصَدَّقَ الْمُرْسَلِينَ ﴿٣٧﴾ إِنَّكُمْ
لَذَائِقُو الْعَذَابِ الْأَلِيمِ ﴿٣٨﴾ وَمَا تُجْزَوْنَ إِلَّا مَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ
﴿٣٩﴾ إِلَّا عِبَادَ اللَّهِ الْمُخْلَصِينَ ﴿٤٠﴾ أُولَٰئِكَ لَهُمْ رِزْقٌ مَّعْلُومٌ ﴿٤١﴾
فَوَاكِهُ وَهُم مُّكْرَمُونَ ﴿٤٢﴾ فِي جَنَّاتِ النَّعِيمِ ﴿٤٣﴾ عَلَىٰ سُرُرٍ مُّتَقَابِلِينَ
﴿٤٤﴾ يُطَافُ عَلَيْهِم بِكَأْسٍ مِّن مَّعِينٍ ﴿٤٥﴾ بَيْضَاءَ لَذَّةٍ لِّلشَّارِبِينَ
﴿٤٦﴾ لَا فِيهَا غَوْلٌ وَلَا هُمْ عَنْهَا يُنزَفُونَ ﴿٤٧﴾ وَعِندَهُمْ قَاصِرَاتُ
الطَّرْفِ عِينٌ ﴿٤٨﴾ كَأَنَّهُنَّ بَيْضٌ مَّكْنُونٌ ﴿٤٩﴾ فَأَقْبَلَ بَعْضُهُمْ عَلَىٰ
بَعْضٍ يَتَسَاءَلُونَ ﴿٥٠﴾ قَالَ قَائِلٌ مِّنْهُمْ إِنِّي كَانَ لِي قَرِينٌ ﴿٥١﴾

(٢٥) پێیان دەوترێت: ئەوە چیتانە بۆ پشتی یەکتر ناگرن، بۆ بەرگری لە یەکێ ناکەن؟!..
(٢٦) نەخێر، تازە کار لە کار ترازاوە ئەمڕۆ هەموویان تەسلیمن و بێ دەسەلاتن.
(٢٧) ئا لەو کاتەدا کە دەوەستێنرێن، یەخەی یەکدەگرن و روو بە ڕووی یەکێ بە توندی قسە دەکەن و پرسیار لە یەکێ دەکەن و یەکتری تاوانبار دەکەن.
(٢٨) ژێر دەستەکان بە ئاغاکانیان دەڵێن: بێگومان ئێوە هەمیشە لای راستتان لێگرتبووین (هەوڵتان دەدا ئێمە بخەڵەتێنن بەدرۆ و بەزۆر).
(٢٩) ئەوانیش لەوەلامیاندا دەڵێن: نەخێر، وا نیە، ئێوە هەر خۆتان ئیماندار نەبوون!!
(٣٠) خۆ ئێمە هیچ زۆر و دەسەلاتێکمان بە سەرتاندا نەبوو، دەستمان نەدەڕۆیشت بەسەرتاندا، ئێوە هەر خۆتان لە سنوور دەرچوو بوون.
(٣١) ئیتر خۆ چارەمان نیە دەبێت بڕیاردادەی پەروەردگارمان بەسەرماندا پیادە بکرێت، دەبێت سزای (بێ ئیمانی و تاوانباری) خۆمان بچێژین.
(٣٢) لە وەلامیاندا دەڵێن: راستە؛ ئێمە ئێوەمان گومڕا کردبوو، بەلام خۆیشمان هەر گومڕاو سەر لێشێواو بووین.
(٣٣) ئەو رۆژە بەراستی هەموویان لە سزاو ئازاردا هاوبەشن، هەروەکێ لە دنیادا هاوکار بوون.
(٣٤) ئێمە بێگومان ئاوا دەکەین بە گوناهکار و تاوانباران.
(٣٥) ئەوانە، کاتێ خۆی کە پێیان دەوترا: هیچ خوایەکێ نیە جگە لە (الله) سەریان بادەدا و فوویان دەکردە خۆیان و فیزیان دەکرد..
(٣٦) دەیانوت: ئێمە چۆن واز لە خواکانمان دەهێنین بۆ شاعیرێکی شێت؟!
(٣٧) نەخێر؛ وا نیە، بەڵکو ئەو حەق و راستەقینەی هێناوە، راستی پێغەمبەرانی پێش خۆیشی سەلماندووە.
(٣٨) (مادەم ئێوە کاتێ خۆی بڕواتان پێنەکرد) دەبێت سزای زۆر بە ئێش بچێژن.(٣٩) تۆڵەتان لێ ناسەنرێت بە قەدەر ئەو کارو کردەوانە نەبێت کەکاتێ خۆی ئەنجامتان دەدا.(٤٠) (ئەوەی باسکرا حاڵی خوانەناسان بوو) بەلام بەندە دڵسۆز و هەڵبژاردەکانی خوا (ئیمانداره بەڕێزەکان).(٤١) ئەوان رزق و رۆزی ئاشکرای زۆرو زەبەندە و دیاری کراویان پێشکەش دەکرێت (لەسەر سینی و دەفری زێڕ و زیو).(٤٢) میوەهاتی هەمەجۆر و هەمەچەشن، هاوڕێ لەگەڵ قەدرو رێزێکی بێ وێنەدا لەلایەن پەروەردگار و فریشتەکانەوە.(٤٣) لە بەهەشتی پڕ لە نازو نیعمەتدا (بۆ هەمیشە دوور لە پیری و نەخۆشی و ناخۆشی). (٤٤) ئەو بەختەوەرانە لەسەر کورسی و قەنەفە رازاوەکان بەرامبەر یەکتری دادەنیشن، (دیارە خوای گەورە دەیخاتە دڵی ئیماندارانەوە بەتایبەتی ئەوانەی ناسیاوی یەکن، تا بەدیداری یەکتر شاد ببن و ناو بەناو یادی ژیانی دنیاو خەباتیان لە پێناوی ئاینی خوادا بکەن).(٤٥) لە پەرداخی تایبەتیدا شەرابی تایبەتیان بەسەردا دەگێڕن.
(٤٦) شەرابەکە زۆر سپی و بەلەزەتە بۆ ئەو کەسانەی کە دەیخۆنەوە و نۆشی دەکەن.(٤٧) ئەو شەرابە نەدەبێتە هۆی سەرئێشە و ئێڵنجدان، نە مەست و سەرخۆش و بێهۆشیان دەکات (وەکێ شەرابە ناپوختەکانی دنیا).
(٤٨) لە تەنیشتیانەوە حۆری چاوگەش دانیشتوون، جگە لە هاوسەرانیان چاو بۆ کەسی تر هەڵنابڕن.
(٤٩) هەر دەڵێی هێلکەی کولاوی پاکێ کراو شاراوەن (کەس دەستی لێ نەداون).(٥٠) ئینجا ئیتر (ئەو بەختەوەرانە بەدەم عەیش و نۆشەوە) پرسیار لە یەکتری دەکەن و (یادگارەکانیان لە دنیادا باس دەکەن).
(٥١) یەکێکیان مۆڵەت دەخوازێت و دەڵێت: من بەراستی کاتێ خۆی لە دنیادا هاوەڵێکم هەبوو...

يَقُولُ أَءِنَّكَ لَمِنَ ٱلْمُصَدِّقِينَ ﴿٥٢﴾ أَءِذَا مِتْنَا وَكُنَّا تُرَابًا وَعِظَٰمًا أَءِنَّا لَمَدِينُونَ ﴿٥٣﴾ قَالَ هَلْ أَنتُم مُّطَّلِعُونَ ﴿٥٤﴾ فَٱطَّلَعَ فَرَءَاهُ فِى سَوَآءِ ٱلْجَحِيمِ ﴿٥٥﴾ قَالَ تَٱللَّهِ إِن كِدتَّ لَتُرْدِينِ ﴿٥٦﴾ وَلَوْلَا نِعْمَةُ رَبِّى لَكُنتُ مِنَ ٱلْمُحْضَرِينَ ﴿٥٧﴾ أَفَمَا نَحْنُ بِمَيِّتِينَ ﴿٥٨﴾ إِلَّا مَوْتَتَنَا ٱلْأُولَىٰ وَمَا نَحْنُ بِمُعَذَّبِينَ ﴿٥٩﴾ إِنَّ هَٰذَا لَهُوَ ٱلْفَوْزُ ٱلْعَظِيمُ ﴿٦٠﴾ لِمِثْلِ هَٰذَا فَلْيَعْمَلِ ٱلْعَٰمِلُونَ ﴿٦١﴾ أَذَٰلِكَ خَيْرٌ نُّزُلًا أَمْ شَجَرَةُ ٱلزَّقُّومِ ﴿٦٢﴾ إِنَّا جَعَلْنَٰهَا فِتْنَةً لِّلظَّٰلِمِينَ ﴿٦٣﴾ إِنَّهَا شَجَرَةٌ تَخْرُجُ فِىٓ أَصْلِ ٱلْجَحِيمِ ﴿٦٤﴾ طَلْعُهَا كَأَنَّهُۥ رُءُوسُ ٱلشَّيَٰطِينِ ﴿٦٥﴾ فَإِنَّهُمْ لَءَاكِلُونَ مِنْهَا فَمَالِـُٔونَ مِنْهَا ٱلْبُطُونَ ﴿٦٦﴾ ثُمَّ إِنَّ لَهُمْ عَلَيْهَا لَشَوْبًا مِّنْ حَمِيمٍ ﴿٦٧﴾ ثُمَّ إِنَّ مَرْجِعَهُمْ لَإِلَى ٱلْجَحِيمِ ﴿٦٨﴾ إِنَّهُمْ أَلْفَوْا۟ ءَابَآءَهُمْ ضَآلِّينَ ﴿٦٩﴾ فَهُمْ عَلَىٰٓ ءَاثَٰرِهِمْ يُهْرَعُونَ ﴿٧٠﴾ وَلَقَدْ ضَلَّ قَبْلَهُمْ أَكْثَرُ ٱلْأَوَّلِينَ ﴿٧١﴾ وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا فِيهِم مُّنذِرِينَ ﴿٧٢﴾ فَٱنظُرْ كَيْفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلْمُنذَرِينَ ﴿٧٣﴾ إِلَّا عِبَادَ ٱللَّهِ ٱلْمُخْلَصِينَ ﴿٧٤﴾ وَلَقَدْ نَادَىٰنَا نُوحٌ فَلَنِعْمَ ٱلْمُجِيبُونَ ﴿٧٥﴾ وَنَجَّيْنَٰهُ وَأَهْلَهُۥ مِنَ ٱلْكَرْبِ ٱلْعَظِيمِ ﴿٧٦﴾

(٥٢) زۆرجار دەیوت: تۆ بڕوا بە شتی وا دەکەیت؟!

(٥٣) ئایا ئەگەر بووینە خاک و ئێسک ئێمە بەراست پاداشت دەدرێینەوە؟!

(٥٤) پاشان ئیماندارەکە ڕوو بە هاوەڵانی ووتی: ئەرێ ئەوە ئێوە تەماشایەک ناکەن: با بزانین ئەو هاوەڵەم حاڵی چۆنە.

(٥٥) هەر کە سەیرێکی کرد بینی وا لە ناوەڕاستی دۆزەخدا گیری خواردووە....

(٥٦) ئەوسا پێی ووت: بەخوا خەریکبوو منیش تیا بەریت، خەریک بوو منیش وەکو خۆت هەڵدێریت.

(٥٧) خۆ ئەگەر نیعمەتی هیدایەتی پەروەردگارم نەبوایە، ئەوە منیش لە ئامادە بووانی ناو دۆزەخ دەبووم.

(٥٨) ئینجا بەختەوەران لە خۆشیدا دەڵێن: ئێمە ئیتر نامرین، ژیانمان بەردەوامە...

(٥٩) جگە لە مردنەکەی یەکەم جارمان، ئێمە ئیتر هیچ ئازار و ئەشکەنجەیەکیش ناچێژین.

(٦٠) بەڕاستی ئا ئەمەیە سەرکەوتن و سەرفەرازی و بەختەوەری گەورە و بێ سنوور.

(٦١) دەبا ئا بۆ ئەم بەهەشتە، بۆ ئەم کامەرانیە، بۆ ئەم نازو نیعمەتە بێسنوورە، ئەوانەی کە کارو کۆشش دەکەن، با بۆ ئەم دەستکەوتانە بیکەن.

(٦٢) باشە، ئایا ئەو بەهەشت و نازو نیعمەتە چاکە؟ یان درەختی ژەقنە بووت.

(٦٣) ئێمە کردوومانە بەهۆی ناخۆشی و ئازار بۆ ستەمکاران (ئەوانەی لە دنیادا گاڵتەیان دەهات و دەیانوت چۆن لەناو ئاگردا درەخت دەڕوێت؟!)

(٦٤) بێگومان ئەوە درەختێکە لە ناخی دۆزەخدایە و لەوێوە (لق و پۆپەکانی) بەهەموو بەشەکانی دۆزەخدا بڵاوکردۆتەوە.

(٦٥) بەروبوومەکەی دەڵێی سەلکەسەری شەیتانەکانە (لە ناشیرینی و بێ لەزەتیدا).

(٦٦) دۆزەخیەکان بە ناچاری لێی دەخۆن، سکیانی لێ پڕ دەکەن.

(٦٧) لەوەودوا شلەمەنیەکی زۆر گەرم دەکەن بەسەریدا (بەزۆر دەرخواردیان دەدرێت).

(٦٨) پاشان (دوای ئەوەی کە تێریان خواردو تێریان خواردەوە!! بە دەم شەق و تێهەڵدان و سەرزەنشتی فریشتەکانی دۆزەخەوە) بەزۆر دەگێردرێنەوە بۆ ناو دۆزەخ، (دیارە براون بۆ شوێنی تایبەتی خواردن و خواردنەوە!!!)

(٦٩) ئەوانە کاتی خۆی باوو باپیرانی خۆیانیان بینی بەگومڕایی (بیریان نەکردەوە و کوێرانە شوێنیان کەوتن).

(٧٠) (ئیتر بەبێ لێکدانەوە) ئەوانە بەشوێنیاندا بەتاڵوکە و هەڵەداوان چوون (باوەڕیان بە پێغەمبەران و ئیمانداران نەکرد).

(٧١) سوێند بە خوا بێگومان زۆربەی پێشینانیان هەر گومڕا بوون (چونکە دڵڕەق بوون و ئامادەی بیستنی ڕاستی نەبوون).

(٧٢) هەرچەندە ئێمە بەڕاستی، پێغەمبەرانی بێدارکەرەوەمان بۆ ڕەوانە کردبوون (بەڵام زۆربەیان گاڵتەیان پێ دەهات).

(٧٣) جا ئیتر تەماشابکە سەرنج بدە، سەرەنجامی بێدارکراوەکان چی بوو (چۆن بە دۆزەخ پاداشت درانەوە!)

(٧٤) جگە لە بەندە دڵسۆزو هەڵبژاردەکانی خوا (کە ئەوان لە دۆزەخ دوورن و بە بەهەشت شاد بوون).

(٧٥) بێگومان نوح هانا و هاواری بۆ هێناین، ئێمەش چاکترین فریاد ڕەسێک بووین کە بەهانا و هاواریەوە چووین.

(٧٦) خۆی و کەسوکاری باوەڕداریمان لە تەنگانە گەورەکە ڕزگار کرد...



وَجَعَلْنَا ذُرِّيَّتَهُۥ هُمُ ٱلْبَاقِينَ ﴿٧٧﴾ وَتَرَكْنَا عَلَيْهِ فِى ٱلْـَٔاخِرِينَ ﴿٧٨﴾ سَلَٰمٌ عَلَىٰ نُوحٍ فِى ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٧٩﴾ إِنَّا كَذَٰلِكَ نَجْزِى ٱلْمُحْسِنِينَ ﴿٨٠﴾ إِنَّهُۥ مِنْ عِبَادِنَا ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴿٨١﴾ ثُمَّ أَغْرَقْنَا ٱلْـَٔاخَرِينَ ﴿٨٢﴾ ۞ وَإِنَّ مِن شِيعَتِهِۦ لَإِبْرَٰهِيمَ ﴿٨٣﴾ إِذْ جَآءَ رَبَّهُۥ بِقَلْبٍ سَلِيمٍ ﴿٨٤﴾ إِذْ قَالَ لِأَبِيهِ وَقَوْمِهِۦ مَاذَا تَعْبُدُونَ ﴿٨٥﴾ أَئِفْكًا ءَالِهَةً دُونَ ٱللَّهِ تُرِيدُونَ ﴿٨٦﴾ فَمَا ظَنُّكُم بِرَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٨٧﴾ فَنَظَرَ نَظْرَةً فِى ٱلنُّجُومِ ﴿٨٨﴾ فَقَالَ إِنِّى سَقِيمٌ ﴿٨٩﴾ فَتَوَلَّوْا۟ عَنْهُ مُدْبِرِينَ ﴿٩٠﴾ فَرَاغَ إِلَىٰٓ ءَالِهَتِهِمْ فَقَالَ أَلَا تَأْكُلُونَ ﴿٩١﴾ مَا لَكُمْ لَا تَنطِقُونَ ﴿٩٢﴾ فَرَاغَ عَلَيْهِمْ ضَرْبًۢا بِٱلْيَمِينِ ﴿٩٣﴾ فَأَقْبَلُوٓا۟ إِلَيْهِ يَزِفُّونَ ﴿٩٤﴾ قَالَ أَتَعْبُدُونَ مَا تَنْحِتُونَ ﴿٩٥﴾ وَٱللَّهُ خَلَقَكُمْ وَمَا تَعْمَلُونَ ﴿٩٦﴾ قَالُوا۟ ٱبْنُوا۟ لَهُۥ بُنْيَٰنًا فَأَلْقُوهُ فِى ٱلْجَحِيمِ ﴿٩٧﴾ فَأَرَادُوا۟ بِهِۦ كَيْدًا فَجَعَلْنَٰهُمُ ٱلْأَسْفَلِينَ ﴿٩٨﴾ وَقَالَ إِنِّى ذَاهِبٌ إِلَىٰ رَبِّى سَيَهْدِينِ ﴿٩٩﴾ رَبِّ هَبْ لِى مِنَ ٱلصَّٰلِحِينَ ﴿١٠٠﴾ فَبَشَّرْنَٰهُ بِغُلَٰمٍ حَلِيمٍ ﴿١٠١﴾ فَلَمَّا بَلَغَ مَعَهُ ٱلسَّعْىَ قَالَ يَٰبُنَىَّ إِنِّىٓ أَرَىٰ فِى ٱلْمَنَامِ أَنِّىٓ أَذْبَحُكَ فَٱنظُرْ مَاذَا تَرَىٰ ۚ قَالَ يَٰٓأَبَتِ ٱفْعَلْ مَا تُؤْمَرُ ۖ سَتَجِدُنِىٓ إِن شَآءَ ٱللَّهُ مِنَ ٱلصَّٰبِرِينَ ﴿١٠٢﴾

(٧٧) جا تەنهاهەر ئەوەی ئەویشمان هێشتەوە (کەببنە هۆی ئاوەدانکردنەوەی زەوی سەرلەنوێ).

(٧٨) هەروەها بەسەرهاتی ئەومان هێشتەوە بۆ نەوەکانی داهاتوو (تا پەندی لێوەربگرن).

(٧٩) سڵاو لەسەر نوح لە لایەن سەرجەم ئیماندارانەوە لە هەموو کات و شوێنێکدا.

(٨٠) بەراستی ئێمە ئا بەو شێوەیە پاداشتی چاکەکاران دەدەینەوە (یادیان دەهێڵینەوە).

(٨١) بەڕاستی ئەو لە بەندە ئیماندارەکانی ئێمەیە.

(٨٢) لەوەودوا ئەوانی ترمان نوقمی زریان کرد.

(٨٣) بێگومان لە شوێنکەوتە و پەیڕەوانی نوح ـ ئیبراهیم ـ ە (سەلامی خوایان لێ بێت).

(٨٤) کاتێک رووی کردە پەروەردگاری، بە پیر بانگەوازیەوە چوو، بەدڵێکی پڕ لە ئیمان و یەک خواناسیەوە.

(٨٥) رۆژێک بە باوکی و قەوم و هۆزەکەی وت: باشە، ئەوە ئێوە چی دەپەرستن؟!

(٨٦) ئایا شتی دەست هەڵبەست دەکەنە خواو لە جیاتی پەروەردگار دەتانەوێت بیپەرستن؟!

(٨٧) باشە؛ ئاخر ئێوە، چ گومانێکتان هەیە لە پەروەردگاری جیهانیان؟!

(٨٨) (ئەوسا چاوی هەڵبڕی بۆ ئاسمان و) تەماشایەکی ئەستێرەکانی کرد، (لە داخی بیروبۆچوونیان).

(٨٩) (دیارە کە سبەی جەژنیان بووە و دەعوەتی حەزرەتی ئیبراهیمیشیان کردووە، ئەمیش حەزی نەکردووە و بێزاربووە بۆیە) وتی: من نەخۆشم.

(٩٠) ئەوانیش بەجێیان هێشت و رۆیشتن.

(٩١) ئەوسا بە پەنهانی چوو بۆ لای بتەکانیان و وتی: ئەوە ناخۆن؟ (دیارە خۆراکیان بۆ بتەکان داناوە!)

(٩٢) ئەوسا هاواری لە بتەکان کردوو، بە توڕەییەوە پێی ووتن: ئەوە بۆ لاڵن؟! بۆ قسەیەکی ژیرانە ناکەن؟!

(٩٣) ئینجا تێیان کەوت، بەدەستی راستی پیادەماڵین و دەیشکاندن.

(٩٤) دوایی بت پەرستان گەڕانەوە و بینیان خواکانیان تێکوپێک شکاون، بەپەلە و شڵەژاوییەوە هاتن بۆ ئیبراهیم...!!

(٩٥) ئەویش پێی وتن: باشە، ئایا ئەو پەیکەرانەی خۆتان دایدەتاشن، دەیپەرستن ؟!

(٩٦) لەکاتێکدا خوا بەدیهێنەری ئێوەش و ئەم بتانەشە کە دروستتان کردوون (نەشیانتوانی بەرگری لە خۆیان بکەن!!).

(٩٧) کەچی بیریان نەکردەوە لەو بەڵگە بەهێزانەو، وتیان: شوێنێک دروست بکەن و ئاگری تێدا بکەنەوە و ئیبراهیمی تێ فڕێ بدەن (با بسوتێت و لەناو بچێت).

(٩٨) ئەوان ویستیان پیلانێکی بۆ دروست بکەن، ئێمە ئەوانمان تێکشکاند و ریسوامان کردن .

(٩٩) ئینجا ئیبراهیم وتی: من بەراستی ئێوە بە جێ دەهێڵم و دەڕۆم بەرەو رەزامەندی پەروەردگارم، لە ئاییندەشدا بەردەوام رێنموویم دەکات.

(١٠٠) (ئەوسا کۆچی کرد)، لەو رێگەو بانەدا داوای لەخوا کردو وتی: پەروەردگارا نەوەیەکی چاک و پاکم پێ ببەخشە.

(١٠١) ئێمەش مژدەی کوڕێکی بە ئارام و خۆگرو ژیرمان پێبەخشی کە ـ ئیسماعیل ـ ە .

(١٠٢) کاتێک ئەو کوڕە کەوتە دەروماڵ لەگەڵیدا بەیانیەک پێی وت: کوڕم، کوڕی شیرینم بێگومان من دەمبینی لە خەونمدا کە تۆ سەردەبڕم، تۆ دەڵێی چی؟ رات چۆنە؟! (کوڕی چاک و خواناس و خۆگر بەزمانی شیرین) وتی: بابەگیان هەر فەرمانێکت پێ دراوە جێبەجێی بکە، دەمبینیت ئەگەر خوا حەز بکات، خوا بیەوێت، لە ئارامگران دەبم.

فَلَمَّآ أَسۡلَمَا وَتَلَّهُۥ لِلۡجَبِينِ ﴿١٠٣﴾ وَنَٰدَيۡنَٰهُ أَن يَٰٓإِبۡرَٰهِيمُ ﴿١٠٤﴾ قَدۡ صَدَّقۡتَ ٱلرُّءۡيَآۚ إِنَّا كَذَٰلِكَ نَجۡزِي ٱلۡمُحۡسِنِينَ ﴿١٠٥﴾ إِنَّ هَٰذَا لَهُوَ ٱلۡبَلَٰٓؤُاْ ٱلۡمُبِينُ ﴿١٠٦﴾ وَفَدَيۡنَٰهُ بِذِبۡحٍ عَظِيمٖ ﴿١٠٧﴾ وَتَرَكۡنَا عَلَيۡهِ فِي ٱلۡأٓخِرِينَ ﴿١٠٨﴾ سَلَٰمٌ عَلَىٰٓ إِبۡرَٰهِيمَ ﴿١٠٩﴾ كَذَٰلِكَ نَجۡزِي ٱلۡمُحۡسِنِينَ ﴿١١٠﴾ إِنَّهُۥ مِنۡ عِبَادِنَا ٱلۡمُؤۡمِنِينَ ﴿١١١﴾ وَبَشَّرۡنَٰهُ بِإِسۡحَٰقَ نَبِيّٗا مِّنَ ٱلصَّٰلِحِينَ ﴿١١٢﴾ وَبَٰرَكۡنَا عَلَيۡهِ وَعَلَىٰٓ إِسۡحَٰقَۚ وَمِن ذُرِّيَّتِهِمَا مُحۡسِنٞ وَظَالِمٞ لِّنَفۡسِهِۦ مُبِينٞ ﴿١١٣﴾ وَلَقَدۡ مَنَنَّا عَلَىٰ مُوسَىٰ وَهَٰرُونَ ﴿١١٤﴾ وَنَجَّيۡنَٰهُمَا وَقَوۡمَهُمَا مِنَ ٱلۡكَرۡبِ ٱلۡعَظِيمِ ﴿١١٥﴾ وَنَصَرۡنَٰهُمۡ فَكَانُواْ هُمُ ٱلۡغَٰلِبِينَ ﴿١١٦﴾ وَءَاتَيۡنَٰهُمَا ٱلۡكِتَٰبَ ٱلۡمُسۡتَبِينَ ﴿١١٧﴾ وَهَدَيۡنَٰهُمَا ٱلصِّرَٰطَ ٱلۡمُسۡتَقِيمَ ﴿١١٨﴾ وَتَرَكۡنَا عَلَيۡهِمَا فِي ٱلۡأٓخِرِينَ ﴿١١٩﴾ سَلَٰمٌ عَلَىٰ مُوسَىٰ وَهَٰرُونَ ﴿١٢٠﴾ إِنَّا كَذَٰلِكَ نَجۡزِي ٱلۡمُحۡسِنِينَ ﴿١٢١﴾ إِنَّهُمَا مِنۡ عِبَادِنَا ٱلۡمُؤۡمِنِينَ ﴿١٢٢﴾ وَإِنَّ إِلۡيَاسَ لَمِنَ ٱلۡمُرۡسَلِينَ ﴿١٢٣﴾ إِذۡ قَالَ لِقَوۡمِهِۦٓ أَلَا تَتَّقُونَ ﴿١٢٤﴾ أَتَدۡعُونَ بَعۡلٗا وَتَذَرُونَ أَحۡسَنَ ٱلۡخَٰلِقِينَ ﴿١٢٥﴾ ٱللَّهَ رَبَّكُمۡ وَرَبَّ ءَابَآئِكُمُ ٱلۡأَوَّلِينَ ﴿١٢٦﴾

(١٠٣) کاتێک هەردووکیان تەسلیمی فەرمانی پەروەردگار بوون، ئیبراهیم؛ ئیسماعیلی بە ڕوودا خستە سەر خاک بۆ ئەوەی سەری ببڕێت.

(١٠٤) ئێمەش بانگمان لێکرد: ئەی ئیبراهیم!!

(١٠٥) بەڕاستی خەوەکەت هێنایە دی، ئێمە هەر ئاوا پاداشتی چاکەکاران دەدەینەوە (لە تاقی کردنەوەکاندا سەریان دەخەین، چونکە لێبڕاون).

(١٠٦) بەڕاستی ئەمە خۆی تاقیکردنەوەیەکی ئاشکراو ڕوونە.

(١٠٧) ئێمەش قۆچێکی گەورەمان کردە قوربانی ئیسماعیل تا لە جیاتی ئەودا سەری ببڕێت.

(١٠٨) پاشان ئێمە لەناو گەلان و نەوەکانی داهاتوودا ناوی ئیبراهیممان هێشتەوە .

(١٠٩) سڵاو و درووود و ڕێز لەسەر ئیبراهیم.

(١١٠) ئێمە ئا بەو شێوەیە پاداشتی چاکەکاران دەدەینەوە...

(١١١) بەڕاستی ئەمیش لەبەندە ئیماندارەکانی ئێمەیە...

(١١٢) مژدەی هاتنە دنیای ـ ئیسحاق ـ یشمان پێبەخشی، کە ئەویش پێغەمبەرێکە لە چاکان.

(١١٣) خێرو بەرەکەتمان ڕژاند بەسەر ئیبراهیم و بەسەر ئیسحاقدا و لە نەوەی هەردووکیان، واتە: ئیسماعیل و ئیسحاق چاکان و پاکان، هەروەها ئەو کەسانەش پەیدا ئەبن بەڕوونی ستەم لەخۆیان دەکەن.

(١١٤) بەڕاستی ئێمە نازو نیعمەتی خۆمانمان ڕژاند بەسەر موسا و هاروون (هەردووکیانمان هەڵبژارد بۆ پێغەمبەرایەتی).

(١١٥) هەردووکیان و قەومەکەشیانمان لە تەنگانە گەورەکە ڕزگارکرد (لە غەرق بوون و خنکان).

(١١٦) سەرکەوتنمان پێبەخشین بەسەر دوژمنەکانیاندا، هەر ئەوانیش زاڵ بوون .

(١١٧) پاشان تەوراتمان پێبەخشین کە ڕوونکەرەوەی هەموو شتێکە، (تا پەیڕەویی بکەن).

(١١٨) هەروەها ڕێنموویی هەردووکیانمان کرد بۆ ڕێگە و ڕێبازی ڕاست ودروست (تا قەومەکەیان سەرفەراز بکەن).

(١١٩) ناوبانگی خێریانمان لە نەوەکانی داهاتوودا هێشتەوە (کە هەتا دنیا دنیایە بەڕێزەوە ناویان ببرێت).

(١٢٠) سڵاو و درووود و ڕێز لەسەر موسا و هاروون (لە لایەن پەروەردگاری مەزن و بەڕێزەوە).

(١٢١) بێگومان ئێمە، ئا بەو شێوەیە پاداشتی چاکەکاران دەدەینەوە (لە دنیاو قیامەتدا ڕێزدارن).

(١٢٢) بەڕاستی هەردووکیان لە بەندە ئیماندارەکانی ئێمە بوون (ئەرکی سەرشانی خۆیان بە چاکی ئەنجامدا).

(١٢٣) بێگومان ـ ئیلیاس ـ یش لە دەستەی پێغەمبەران و ڕەوانە کراوانە (لە لایەن ئێمەوە).

(١٢٤) ئەو کاتە ئەویش بە قەوم و گەلەکەی خۆی وت: ئەوە ناکرێت خواناس بن؟ ئەوە بۆ لە خوا ناترسن؟!

(١٢٥) ئایا ئێوە هاناو هاوارو نزا بۆ ـ بەعل ـ دەبەن (بتێکی گەورە بوو دەیانپەرست) وە واز لە خواپەرستی دەهێنن لەکاتێکدا ئەو زاتە چاکترینی دروستکارەکانە.

(١٢٦) کە ـ الله ـ یە، پەروەردگارتانە، پەروەردگاری باو و باپیرانی دێرینیشتانە (ئەوە بۆ بیرێک ناکەنەوە)؟!

فَكَذَّبُوهُ فَإِنَّهُمْ لَمُحْضَرُونَ ﴿١٢٧﴾ إِلَّا عِبَادَ اللَّهِ الْمُخْلَصِينَ ﴿١٢٨﴾
وَتَرَكْنَا عَلَيْهِ فِي الْآخِرِينَ ﴿١٢٩﴾ سَلَامٌ عَلَىٰ إِلْ يَاسِينَ ﴿١٣٠﴾ إِنَّا كَذَٰلِكَ
نَجْزِي الْمُحْسِنِينَ ﴿١٣١﴾ إِنَّهُ مِنْ عِبَادِنَا الْمُؤْمِنِينَ ﴿١٣٢﴾ وَإِنَّ لُوطًا
لَمِنَ الْمُرْسَلِينَ ﴿١٣٣﴾ إِذْ نَجَّيْنَاهُ وَأَهْلَهُ أَجْمَعِينَ ﴿١٣٤﴾ إِلَّا عَجُوزًا
فِي الْغَابِرِينَ ﴿١٣٥﴾ ثُمَّ دَمَّرْنَا الْآخَرِينَ ﴿١٣٦﴾ وَإِنَّكُمْ لَتَمُرُّونَ عَلَيْهِم
مُّصْبِحِينَ ﴿١٣٧﴾ وَبِاللَّيْلِ أَفَلَا تَعْقِلُونَ ﴿١٣٨﴾ وَإِنَّ يُونُسَ لَمِنَ
الْمُرْسَلِينَ ﴿١٣٩﴾ إِذْ أَبَقَ إِلَى الْفُلْكِ الْمَشْحُونِ ﴿١٤٠﴾ فَسَاهَمَ فَكَانَ
مِنَ الْمُدْحَضِينَ ﴿١٤١﴾ فَالْتَقَمَهُ الْحُوتُ وَهُوَ مُلِيمٌ ﴿١٤٢﴾ فَلَوْلَا أَنَّهُ
كَانَ مِنَ الْمُسَبِّحِينَ ﴿١٤٣﴾ لَلَبِثَ فِي بَطْنِهِ إِلَىٰ يَوْمِ يُبْعَثُونَ ﴿١٤٤﴾
۞ فَنَبَذْنَاهُ بِالْعَرَاءِ وَهُوَ سَقِيمٌ ﴿١٤٥﴾ وَأَنبَتْنَا عَلَيْهِ شَجَرَةً
مِّن يَقْطِينٍ ﴿١٤٦﴾ وَأَرْسَلْنَاهُ إِلَىٰ مِائَةِ أَلْفٍ أَوْ يَزِيدُونَ ﴿١٤٧﴾
فَآمَنُوا فَمَتَّعْنَاهُمْ إِلَىٰ حِينٍ ﴿١٤٨﴾ فَاسْتَفْتِهِمْ أَلِرَبِّكَ الْبَنَاتُ
وَلَهُمُ الْبَنُونَ ﴿١٤٩﴾ أَمْ خَلَقْنَا الْمَلَائِكَةَ إِنَاثًا وَهُمْ
شَاهِدُونَ ﴿١٥٠﴾ أَلَا إِنَّهُم مِّنْ إِفْكِهِمْ لَيَقُولُونَ ﴿١٥١﴾ وَلَدَ
اللَّهُ وَإِنَّهُمْ لَكَاذِبُونَ ﴿١٥٢﴾ أَصْطَفَى الْبَنَاتِ عَلَى الْبَنِينَ ﴿١٥٣﴾




(١٢٧) کەچی ئەوان بڕوایـان پـێ نـەکرد، کـەوابوو بێگومان ئەوان ئامادەکراون بۆ دۆزەخ.
(١٢٨) جگە لە بەندە دڵسۆزو هەڵبژاردەکانی خوا.
(١٢٩) ئینجا ناوبـانگی خـێری ئیلیاسمـان لـە نەوەکانی داهاتوودا هێشتەوە.
(١٣٠) سڵاو و درووود و ڕێز لەسەر ئیلیاسین بێت.
(١٣١) ئێمـە بەڕاسـتی بـەو شـێوەیە پاداشـتی چاکەکاران دەدەینەوە.
(١٣٢) بێگومان ئەویش لـە بـەندە ئیماندارەکـانی ئێمەیە.
(١٣٣) بەڕاستی ـ لوط ـ یش لە پێغەمبەرانە.
(١٣٤) کاتێ خۆی ئەو و هەموو کەس و کاریمـان ڕزگار کرد.
(١٣٥) بێجگـە لـە پـیرەژنێک (بێبـاوەڕ بـوو بەردەوام گرفتی بۆ پێش دەهێنا) لەناومان برد.
(١٣٦) پاشان هەمووانمان تەفرو تونا کرد.
(١٣٧) بێگومـان ئێـوە هـەموو بەیانیـەک دەڕۆن بەسەر شوێنەوارەکانیاندا.
(١٣٨) هـەروەها لـە شەویشـدا (هـەندێک جـار لەوێوە تێدەپەڕن) ئایا ئەوە ژیریتـان ناخەنـە کـارو بیرێک ناکەنەوە (چیمان بەسەر هێنان؟!).
(١٣٩) بەڕاستی ـ یونس ـ یش لە پێغەمبەرانە.
(١٤٠) کـەچی ڕای کـرد بـەرەو کەشـتیە پـڕ لـە کەلوپەل و خەڵکەکە...
(١٤١) ئەوسا بەناچاری بەشداری قورعەی کرد، لە ڕیزی ئەوانەدا بوو کەلە قورعەکەدا سەرنەکەوتن..
(١٤٢) ئینجا نەهـەنگێک قووتـی دا، لـەکاتێکدا کە شایانی سەرزەنشت و گلەیی بوو (چونکە پێش ئەوەی خوا مۆڵەتی بدات قەومەکەی بەجێهێشت).
(١٤٣) خۆ ئەگـەر لـەو کەسـانە نەبوایـە کـە تەسبیحات و یادیخوا دەکەن و ئەیوتایە (لا إله إلا أنت سبحانك إني كنت من الظـالمين): پـەروەردگارا هیـچ خوایـەک نیـە جگەلە تۆ، پاکی و بێگەردی و ستایش شایستەی تۆیە و من لە ستەمکارانم.
(١٤٤) ئەوە دەمایەوە لە سکی نەهەنگەکەدا تا ڕۆژێک کە هەمووان زیندوو دەکرێنەوە.
(١٤٥) لەوەودوا فڕێماندایە چۆڵیەکی بێ گژوگیاو درەختەوە بێ هێز و ماندوو نەخۆش.
(١٤٦) ئینجا ڕوەکی کولەکەی گەورەمان بۆ پێگەیاند (کە گەڵاکانی پان و گەورەیە و مێش و مەگە نزیکی ناکەون).
(١٤٧) ئینجا گەڕانمانەوە و ڕەوانەمانکرد بە پێغەمبەرایەتی بۆلای سەد هەزار کەس و زیاتریش دەبن (کە قەومەکەیەتی).
(١٤٨) ئەوسا هەمویان ئیمان و باوەڕیان هێنا، ئێمەش ژیانێکی خۆشمان بۆ فەراهەم هێنان تا کاتێکی دیاریکراو.
(١٤٩) ئەی پێغەمبەر ڕاپرسیان لی بکە: ئایا ڕاستە! کە کچان شایستەی پەروەردگارت بن و کوڕان شایستەی خۆیان بێت؟!
(ئەڵبەتە کوڕو کچ هەردوو بەدیهێنراوی خوان، پێـوەر تەنـها تەقوایـە، بـەڵام قورئـان دەیـەوێت، بـە بـیرو بۆچوونـی خۆیـان، پووچەڵی بەڵگەکەیان دەربخات، کاتێ کە وتویانە: فریشتەکان کچی خوان، لـەحاڵێکدا ئـەوان کـچ بـەچاوی سـووک تەماشـا دەکەن وبەکەمی دەزانن، ئەی بۆچی بۆخوای پەروەردگار کەلە هەموو ئەو بیروباوەڕە چەوتانەوە دوورە ڕەوای دەبینن؟)
(١٥٠) ئایا مەگەر فریشتەکانمان بە مێینە دروست کردووە و لەو کاتەدا ئەوان لەوێ بوون؟!
(١٥١) ئاگاداربن!! بەڕاستی ئەوانە هەندێک لەدرۆ و بوختانیان ئەوەیە کە دەڵێن:
(١٥٢) خوا منداڵی بووە !! ، بەڕاستی و بێگومان ئەوانە زۆر درۆزنن.
(١٥٣) ئایا مەگەر کچانی هەڵبژاردووە کە بیکات بە نەوەی خۆی وە ڕێزی داون بەسەر کوڕاندا؟!!

مَا لَكُمْ كَيْفَ تَحْكُمُونَ ﴿١٥٤﴾ أَفَلَا تَذَكَّرُونَ ﴿١٥٥﴾ أَمْ لَكُمْ سُلْطَانٌ مُّبِينٌ ﴿١٥٦﴾ فَأْتُوا بِكِتَابِكُمْ إِن كُنتُمْ صَادِقِينَ ﴿١٥٧﴾ وَجَعَلُوا بَيْنَهُ وَبَيْنَ الْجِنَّةِ نَسَبًا وَلَقَدْ عَلِمَتِ الْجِنَّةُ إِنَّهُمْ لَمُحْضَرُونَ ﴿١٥٨﴾ سُبْحَانَ اللَّهِ عَمَّا يَصِفُونَ ﴿١٥٩﴾ إِلَّا عِبَادَ اللَّهِ الْمُخْلَصِينَ ﴿١٦٠﴾ فَإِنَّكُمْ وَمَا تَعْبُدُونَ ﴿١٦١﴾ مَا أَنتُمْ عَلَيْهِ بِفَاتِنِينَ ﴿١٦٢﴾ إِلَّا مَنْ هُوَ صَالِ الْجَحِيمِ ﴿١٦٣﴾ وَمَا مِنَّا إِلَّا لَهُ مَقَامٌ مَّعْلُومٌ ﴿١٦٤﴾ وَإِنَّا لَنَحْنُ الصَّافُّونَ ﴿١٦٥﴾ وَإِنَّا لَنَحْنُ الْمُسَبِّحُونَ ﴿١٦٦﴾ وَإِن كَانُوا لَيَقُولُونَ ﴿١٦٧﴾ لَوْ أَنَّ عِندَنَا ذِكْرًا مِّنَ الْأَوَّلِينَ ﴿١٦٨﴾ لَكُنَّا عِبَادَ اللَّهِ الْمُخْلَصِينَ ﴿١٦٩﴾ فَكَفَرُوا بِهِ فَسَوْفَ يَعْلَمُونَ ﴿١٧٠﴾ وَلَقَدْ سَبَقَتْ كَلِمَتُنَا لِعِبَادِنَا الْمُرْسَلِينَ ﴿١٧١﴾ إِنَّهُمْ لَهُمُ الْمَنصُورُونَ ﴿١٧٢﴾ وَإِنَّ جُندَنَا لَهُمُ الْغَالِبُونَ ﴿١٧٣﴾ فَتَوَلَّ عَنْهُمْ حَتَّىٰ حِينٍ ﴿١٧٤﴾ وَأَبْصِرْهُمْ فَسَوْفَ يُبْصِرُونَ ﴿١٧٥﴾ أَفَبِعَذَابِنَا يَسْتَعْجِلُونَ ﴿١٧٦﴾ فَإِذَا نَزَلَ بِسَاحَتِهِمْ فَسَاءَ صَبَاحُ الْمُنذَرِينَ ﴿١٧٧﴾ وَتَوَلَّ عَنْهُمْ حَتَّىٰ حِينٍ ﴿١٧٨﴾ وَأَبْصِرْ فَسَوْفَ يُبْصِرُونَ ﴿١٧٩﴾ سُبْحَانَ رَبِّكَ رَبِّ الْعِزَّةِ عَمَّا يَصِفُونَ ﴿١٨٠﴾ وَسَلَامٌ عَلَى الْمُرْسَلِينَ ﴿١٨١﴾ وَالْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ ﴿١٨٢﴾

سُورَةُ صٓ

(١٥٤) ئایا چیتانە و چۆن بڕیاری بێ بەڵگەی وا دەدەن.
(١٥٥) ئایا بیرێک ناکەنەوە؟ (لەم قسە بێسەرو بنانە؟! لەم تۆمەتە ناماقوڵانە؟!).
(١٥٦) ئایا مەگەر بەڵگە و شتێکی بەهێز و ئاشکراتان بەدەستەوەیە (بۆ ئەم قسە هەڵەق و مەڵەقانە).
(١٥٧) ئادەی .. کوا کتێبتان، کوا بەڵگەتان ئەگەر ئێوە ڕاست دەکەن بیهێننە مەیدان . .
(١٥٨) (لەلایەکی ترەوە کافرەکان) خزمایەتیان بڕیارداوە لە نێوان زاتی پەروەردگار و پەریەکاندا، سوێند بەخوا پەریەکانیش چاک زانیویانە کە ئامادە دەکرێن (بۆ لێپرسینەوە و موحاسەبە، ئەگەر ئاوا خزمایەتیەک هەبێت چۆن دادگایی دەکرێن؟!).
(١٥٩) پاکی و بێگەردی بۆ خوای گەورە، دەربارەی ئەو شتانەی کە ئەوان باسی دەکەن و ئەو قسە بێجێیانەی دەیکەن بەرامبەر خوا.
(١٦٠) بەڵام بەندە دڵسۆزو هەڵبژاردەکانی خوا (لەو گوفتار و بۆچوونە خوار و خێچانە دوورن)
(١٦١) ئەی بێ باوەڕان بەراستی ئێوە و ئەوەش دەیپەرستن.
(١٦٢) ناتوانن کەسی پێ گومڕاو سەرلێشێواو بکەن و لە خوای دوور بخەنەوە.
(١٦٣) مەگەر ئەو کەسەی نیشتەجێی ناو دۆزەخەوە.
(١٦٤) فریشتەکان دەڵێن: کەسمان نییە شوێنی دیاریکراوی خۆی نەبێت.
(١٦٥) بەراستی ئێمە هەر هەموومان بەریز وەستاوین (ئامادەی فەرمانین).
(١٦٦) دووبارە دەڵێن: ئێمە هەمووەدەم سەرگەرمی تەسبیحات و ستایشی خوای میهرەبانین.
(١٦٧) هەرچەندە هاوەڵگەران پێش ڕەوانەکردنی پێغەمبەر دەیانوت:
(١٦٨) ئەگەر ئێمەش کتێبێکی ئاسمانیمان وەکو پێشووەکان بۆ بهاتایە...
(١٦٩) ئێمەش دەبووینە بەندە دڵسۆز و چاکەکانی خوای گەورە.
(١٧٠) کەچی کە قورئانمان ڕەوانە کرد بڕوایان پێ نەکرد، سەرئەنجام خۆیان دەبیننەوە (چیان بەسەر دەهێنین).
(١٧١) سوێند بەخوا بێگومان بڕیاری ئێمە بۆ بەندە فرستادە و پێغەمبەرەکانمان (هەر زوو دەرچووە)...
(١٧٢) کە: بە دڵنیایی، هەر ئەوان سەرکەوتوو سەرفەراز دەبن.
(١٧٣) سەربازە ئیماندارەکانیشمان هەر دەسەڵات دەگرنە دەست و زاڵ دەبن.
(١٧٤) جارێ تا ماوەیەک خۆت بگرە و گوێیان پێ مەدە.
(١٧٥) تۆ سەرئەنجامی لاری و خوانەناسینیان بخەرە بەرچاو، لە ئایندەدا خۆیان دەبیننەوە.
(١٧٦) ئایا ئەوانە پەلەیانە کە زوو سزاو تۆڵەی ئێمە ڕووبەڕوویان ببێت و یەخەیان پێ بگرێت؟!
(١٧٧) (قوڕ بەسەریان، خاک بە دامانیان) کاتێک کە سزاو تۆڵەی ئێمە دادەبەزێتە مەیدانیان، ئای کە بەرەبەیانێکی سامناکە بۆ بێدار کراوەکان.
(١٧٨) تۆ تا ماوەیەک مۆڵەتیان بدە و گوێیان پێ مەدە.
(١٧٩) ڕاستیەکان بخەرە بەرچاو، سەرئەنجام خۆیان دەبیننەوە.
(١٨٠) پاکی و بێگەردی بۆ پەروەردگارت، پەروەردگاری خاوەن دەسەڵات، لەوەی کە ئەوانە دەیدەنە پاڵ ئەو زاتە بێ هاوەڵ و هاوتایە.
(١٨١) سڵاو و درووودیش لەسەر هەموو پێغەمبەران و سەرجەم فرستادەکانی خوا .
(١٨٢) سوپاس و ستایشیش بۆ خوا، پەروەردگاری هەموو جیهانان هەمیشە و بەردەوام.

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

صٓ وَٱلْقُرْءَانِ ذِى ٱلذِّكْرِ ﴿١﴾ بَلِ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ فِى عِزَّةٍ وَشِقَاقٍ ﴿٢﴾ كَمْ أَهْلَكْنَا مِن قَبْلِهِم مِّن قَرْنٍ فَنَادَوا۟ وَّلَاتَ حِينَ مَنَاصٍ ﴿٣﴾ وَعَجِبُوٓا۟ أَن جَآءَهُم مُّنذِرٌ مِّنْهُمْ ۖ وَقَالَ ٱلْكَٰفِرُونَ هَٰذَا سَٰحِرٌ كَذَّابٌ ﴿٤﴾ أَجَعَلَ ٱلْءَالِهَةَ إِلَٰهًا وَٰحِدًا ۖ إِنَّ هَٰذَا لَشَىْءٌ عُجَابٌ ﴿٥﴾ وَٱنطَلَقَ ٱلْمَلَأُ مِنْهُمْ أَنِ ٱمْشُوا۟ وَٱصْبِرُوا۟ عَلَىٰٓ ءَالِهَتِكُمْ ۖ إِنَّ هَٰذَا لَشَىْءٌ يُرَادُ ﴿٦﴾ مَا سَمِعْنَا بِهَٰذَا فِى ٱلْمِلَّةِ ٱلْءَاخِرَةِ إِنْ هَٰذَآ إِلَّا ٱخْتِلَٰقٌ ﴿٧﴾ أَءُنزِلَ عَلَيْهِ ٱلذِّكْرُ مِنۢ بَيْنِنَا ۚ بَلْ هُمْ فِى شَكٍّ مِّن ذِكْرِى ۖ بَل لَّمَّا يَذُوقُوا۟ عَذَابِ ﴿٨﴾ أَمْ عِندَهُمْ خَزَآئِنُ رَحْمَةِ رَبِّكَ ٱلْعَزِيزِ ٱلْوَهَّابِ ﴿٩﴾ أَمْ لَهُم مُّلْكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَمَا بَيْنَهُمَا ۖ فَلْيَرْتَقُوا۟ فِى ٱلْأَسْبَٰبِ ﴿١٠﴾ جُندٌ مَّا هُنَالِكَ مَهْزُومٌ مِّنَ ٱلْأَحْزَابِ ﴿١١﴾ كَذَّبَتْ قَبْلَهُمْ قَوْمُ نُوحٍ وَعَادٌ وَفِرْعَوْنُ ذُو ٱلْأَوْتَادِ ﴿١٢﴾ وَثَمُودُ وَقَوْمُ لُوطٍ وَأَصْحَٰبُ لْـَٔيْكَةِ ۚ أُو۟لَٰٓئِكَ ٱلْأَحْزَابُ ﴿١٣﴾ إِن كُلٌّ إِلَّا كَذَّبَ ٱلرُّسُلَ فَحَقَّ عِقَابِ ﴿١٤﴾ وَمَا يَنظُرُ هَٰٓؤُلَآءِ إِلَّا صَيْحَةً وَٰحِدَةً مَّا لَهَا مِن فَوَاقٍ ﴿١٥﴾ وَقَالُوا۟ رَبَّنَا عَجِّل لَّنَا قِطَّنَا قَبْلَ يَوْمِ ٱلْحِسَابِ ﴿١٦﴾

سوورەتی (ص)

بەناوی خوای بەخشندە و میهرەبان

(١) (ص) سەرنجی سەرەتای سورەتی (البقـرة) بدە، سوێند بەم قورئانە کـە خـاوەنی ئامۆژگاری و شکۆمەندی و قەدر و ڕێزە.

(٢) کەچی ئەوانـەی بـێ بـاوەڕ بـوون (بـڕوا بـەم قورئانە پیرۆزە ناهێنن، ئەوە لەبەرئـەوە نیـە کـەم و کووڕی و ناتـەواوی لـەم قورئانـەدا هـەبێت) بـەڵکو لەبەرئەوەیە کە خۆیان بـەزل دەزانـن و بڕیاریانداوە لووت بەرز بن لە ئاستیدا و دژایەتی بکەن.

(٣) چەندەها گـەل و نـەوەمان پێش ئـەمان لـەناو بردووە (لـەکاتی دەسـتپێکردنی سـزای ئێمـەدا) هاواریان دەکرد، شیوەن و زاریـان بـوو، بـەڵام تـازە کار لەکار ترازابوو، وەختی ڕزگاربوون بەسەرچوو.

(٤) بـێ باوەڕەکـان سەریانسـوڕما لـەوەی کـە بێدارکەرەوەیەک لە خۆیان هـاتووە بۆیـان و وتیـان: ئائەمە جادوگەرێکی زۆر درۆزنە.

(٥) (هەروەها دەیـانوت: ئایـا پێتـان سـەیر نیـە) هەموو خواکانی کردووە بـە یـەک خـوا، بەڕاسـتی ئەمە شتێکی زۆر سەیرو سەمەرەیە!!

(٦) دەسـەڵاتدار و گـەورەکانیان ڕۆیشـتن بـۆ لای یەکتر، داوای پابەندی و خۆگریان دەکرد، لـە پێنـاو بتـەکانیاندا و دەربـارەی بانگـەوازی یەکخواناسـی دەیانوت: بەڕاستی ئەمـە شـتێکە مەبەسـتێکی تیادایە (کە ببێتە گەورە)..!!

(٧) ئێمە ئەم دەنگوباسـەمان لـەکۆتا ئـایندا (کـە ئاینی مەسیحیە و سێ خوا دەپەرستن) نەبیستووە! ئەمـە هـەر تەنـها شـتێکی دەسـت هەڵبەسـت و دروستکراوە!!

(٨) هەروەها دەیانوت: ئایا ڕەوایە لە نێوان ئێمەماناندا قورئان بۆ محمد ﷺ دابەزێت؟! خوا دەفەرموێت: نەخێر، ئەوانە هەر لەگومانداں بەرامبەر قورئانەکەی من، جا ئەگەر سزاو ئازاری من بچێژن (ئەوسا باوەڕی پێ دەهێنن)؟!!

(٩) مەگەر ئەمانە گەنجینەی ڕەحمەت و بەخشندەیی پەروەردگاری تۆیان بەدەستە کە زاتێکی باڵادەست و بەخشندەیە (تا دیاریکردنی پێغەمبەریش بەویستی ئەوان بێت)؟!

(١٠) ئایا مەگەر ئەوانە خاوەنی ئاسمانەکان و زەوی و نێوانیانن، تا خێرو بێرو بەخشینەوەش بەئارەزوی ئەوان بێت؟ ئەگەر وایە با بەهۆکارێک بەرزبنەوە بۆ ئاسمان و دەست بخەنە کاروباری خوا..!!

(١١) سەربازانێکی زۆر وا لەوێن، لە دەستەو گرۆ جۆر بە جۆرەکان، هەمیشە تێکدەشکێن.

(١٢) پێش ئەمان قەومی نوح و عاد و فیرعەونی خاوەنی هێزو دەسەڵات (مەبەست ئەهرامەکانە)...

(١٣) هەروەها ثمود، قەومی صالح و قەومی لوط و خاوەن باخە چڕو پڕەکان، ئائـەو دەسـتە و گرۆیانـە (هـەر هـەموویان دژایەتی ئاین و بەرنامەی خوایان کرد، خوای گەورەش دوای ماوەیەکی دیاریکراو هەموویانی ڕیشەکەن کرد).

(١٤) هەریەک لەوانە بەرنامەی هەموو پێغەمبەرانیان بەدرۆزانی و بەو کارەیان؛ خۆیان شایستەی تۆڵەی ئێمە کرد.

(١٥) ئەوانە چاوەڕوانی هیچ شتێک ناکەن، تەنها یەکدەنگی سامناکی گەورە نەبێت، کە کتوپڕ ڕوودەدات و پێویستی بە دووبارە بوونەوە نیە.

(١٦) کەچی خەڵکی نەفام دەڵێن: پەروەردگارا هەر چیت بۆ بڕیارداوین پێش ڕۆژی لێپرسینەوە، پێمان ببەخشە.

ٱصْبِرْ عَلَىٰ مَا يَقُولُونَ وَٱذْكُرْ عَبْدَنَا دَاوُۥدَ ذَا ٱلْأَيْدِ ۖ إِنَّهُۥٓ أَوَّابٌ ﴿١٧﴾ إِنَّا سَخَّرْنَا ٱلْجِبَالَ مَعَهُۥ يُسَبِّحْنَ بِٱلْعَشِىِّ وَٱلْإِشْرَاقِ ﴿١٨﴾ وَٱلطَّيْرَ مَحْشُورَةً ۖ كُلٌّ لَّهُۥٓ أَوَّابٌ ﴿١٩﴾ وَشَدَدْنَا مُلْكَهُۥ وَءَاتَيْنَٰهُ ٱلْحِكْمَةَ وَفَصْلَ ٱلْخِطَابِ ﴿٢٠﴾ ۞ وَهَلْ أَتَىٰكَ نَبَؤُا۟ ٱلْخَصْمِ إِذْ تَسَوَّرُوا۟ ٱلْمِحْرَابَ ﴿٢١﴾ إِذْ دَخَلُوا۟ عَلَىٰ دَاوُۥدَ فَفَزِعَ مِنْهُمْ ۖ قَالُوا۟ لَا تَخَفْ ۖ خَصْمَانِ بَغَىٰ بَعْضُنَا عَلَىٰ بَعْضٍ فَٱحْكُم بَيْنَنَا بِٱلْحَقِّ وَلَا تُشْطِطْ وَٱهْدِنَآ إِلَىٰ سَوَآءِ ٱلصِّرَٰطِ ﴿٢٢﴾ إِنَّ هَٰذَآ أَخِى لَهُۥ تِسْعٌ وَتِسْعُونَ نَعْجَةً وَلِىَ نَعْجَةٌ وَٰحِدَةٌ فَقَالَ أَكْفِلْنِيهَا وَعَزَّنِى فِى ٱلْخِطَابِ ﴿٢٣﴾ قَالَ لَقَدْ ظَلَمَكَ بِسُؤَالِ نَعْجَتِكَ إِلَىٰ نِعَاجِهِۦ ۖ وَإِنَّ كَثِيرًا مِّنَ ٱلْخُلَطَآءِ لَيَبْغِى بَعْضُهُمْ عَلَىٰ بَعْضٍ إِلَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ وَقَلِيلٌ مَّا هُمْ ۗ وَظَنَّ دَاوُۥدُ أَنَّمَا فَتَنَّٰهُ فَٱسْتَغْفَرَ رَبَّهُۥ وَخَرَّ رَاكِعًا وَأَنَابَ ۩ ﴿٢٤﴾ فَغَفَرْنَا لَهُۥ ذَٰلِكَ ۖ وَإِنَّ لَهُۥ عِندَنَا لَزُلْفَىٰ وَحُسْنَ مَـَٔابٍ ﴿٢٥﴾ يَٰدَاوُۥدُ إِنَّا جَعَلْنَٰكَ خَلِيفَةً فِى ٱلْأَرْضِ فَٱحْكُم بَيْنَ ٱلنَّاسِ بِٱلْحَقِّ وَلَا تَتَّبِعِ ٱلْهَوَىٰ فَيُضِلَّكَ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ ۚ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَضِلُّونَ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ لَهُمْ عَذَابٌ شَدِيدٌۢ بِمَا نَسُوا۟ يَوْمَ ٱلْحِسَابِ ﴿٢٦﴾

(١٧) ئەی پێغەمبەر ﷺ تۆ خۆگربە لە بەرامبەر هەموو ئەو گوفتارە نادروست و هەڵانەوە کە دەیڵێن، بەلکو یادی بەندەمان داود بکە کە توانایی و دەسەڵاتمان پێ بەخشیبوو، بەڕاستی ئەو هەمیشە دڵی لای ئێمە بوو، بەتەنگ ڕەزامەندی ئێمەوە بوو.

(١٨) بەراستی ئێمەش کەژ و کێوەکانمان بۆ رام هێنابوو، ئەوانیش یاد و تەسبیحاتی خوایان دەکرد و پێکەوە دەیانوتەوە لە دەمە و ئێواران و بەرەبەیانەکاندا.

(١٩) هەروەها باڵندەکانیشمان بۆ رام هێنابوو بە دەوریشیدا کۆ کرابوونەوە، هەموویان پێکەوە تەسبیحاتیان دەکرد، هەموویان گوێڕایەڵ و فەرمانبەرداری خوا بوون.

(٢٠) ئێمە پاشایەتیەکەمان بەهێزکردوحیکمەت ودانایی وقسە و فەرمانی بەجێمان پێبەخشی.

(٢١) ئەی پێغەمبەر ﷺ ئایا هەواڵی ئەوانەت پێنەگەیشتووە کە کێشەیەکیان هەبوو، بە دیوارا سەرکەوتن وخۆیان گەیاندە میحرابەکەی!

(٢٢) کاتێک خۆیانکرد بە ژووردا و چوونە لای داود، ئەویش لێیان ترسا، بەڵام ئەوان وتیان: مەترسە، هەردووکمان ناکۆکیەکمان هەیە و لایەکمان ستەمی لەلایەکمان کردووە، داواکارین کە بە دادپەروەریی لە نێوانماندا بڕیار بدەیت و لایەنی هیچ کەسێکمان نەگریت، ڕێنمووییشمان بکە بۆ ڕێگەی راست و دروست.

(٢٣) یەکێکیان وتی: بەراستی ئەم برایەم نەوەد و نۆ مەڕی هەیە بەڵام من تەنها یەک مەڕم هەیە، کەچی پێم دەڵێت: ئەو مەڕەشم بدەرێ، بەقسەی زل و زۆرزانی دەیەوێت لێم زەوت بکات.

(٢٤) داود وتی: سوێند بە خوا بێگومان ئەو برایەت ستەمی لێ کردوویت بەوەی دەیەوێت تاکە مەڕەکەی تۆ بخاتە سەر مەڕەکانی خۆی، لەڕاستیدا زۆربەی ئەوانەی شەریک و هاوکارن ستەم لە یەکتری دەکەن، جگە لەوانەی کە ئیمان و باوەڕیان هەیە و کاروکردەوەی چاک ئەنجام دەدەن، ئەوانیش زۆر کەمن، (ئینجا دووکەسەکە دیارنەمان) ئەوسا ئیتر داود زانی کە ئێمە تەنها تاقیمان کردۆتەوە، (لەبەر دوو هۆی سەرەکی، یەکەم: فیر ببێت بەپەلە حوکم دەرنەکات.. دووهەم: لەبەر ئەوەی سوێندی خوارد لەسەر شتێک کە لێکۆڵینەوەی دەربارەی نەکردبوو) ئیتر داوای لێخۆشبوونی لە پەروەردگاری کردو بەکڕنووش و سوژدەدا چوو، داوای لێبووردنی کرد..

(٢٥) ئێمەش لەو هەڵەیەی خۆش بووین، بێگومان ئەو لە نزیکان و خۆشەویستانی ئێمەیە و خۆشترین جێگە و ڕێگەمان بۆ ئامادە کردووە.

(٢٦) ئەی داود: بەراستی ئێمە تۆمان کردۆتە جێنشین لەم وڵاتەدا، فەرمانڕەوایی لە نێوان خەڵکدا لەسەر بنچینەی حەق و راستی ئەنجام بدە، هەرگیز شوێنی ئارەزوو مەکەوە، تا نەبێتە هۆی گومڕاکردن و لادانت لە ڕێبازی خوا، چونکە بێگومان ئەوانەی لە ڕێبازی خوا لادەدەن، سزای بە ئێش و پڕ ئازار بۆیان ئامادەیە، بەهۆی فەرامۆشکردنی ڕۆژی لێپرسینەوە.

وَمَا خَلَقْنَا ٱلسَّمَآءَ وَٱلْأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَا بَٰطِلًاۚ ذَٰلِكَ ظَنُّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْۚ فَوَيْلٌ لِّلَّذِينَ كَفَرُواْ مِنَ ٱلنَّارِ ﴿٢٧﴾ أَمْ نَجْعَلُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ كَٱلْمُفْسِدِينَ فِي ٱلْأَرْضِ أَمْ نَجْعَلُ ٱلْمُتَّقِينَ كَٱلْفُجَّارِ ﴿٢٨﴾ كِتَٰبٌ أَنزَلْنَٰهُ إِلَيْكَ مُبَٰرَكٌ لِّيَدَّبَّرُوٓاْ ءَايَٰتِهِۦ وَلِيَتَذَكَّرَ أُوْلُواْ ٱلْأَلْبَٰبِ ﴿٢٩﴾ وَوَهَبْنَا لِدَاوُۥدَ سُلَيْمَٰنَۚ نِعْمَ ٱلْعَبْدُۖ إِنَّهُۥٓ أَوَّابٌ ﴿٣٠﴾ إِذْ عُرِضَ عَلَيْهِ بِٱلْعَشِيِّ ٱلصَّٰفِنَٰتُ ٱلْجِيَادُ ﴿٣١﴾ فَقَالَ إِنِّيٓ أَحْبَبْتُ حُبَّ ٱلْخَيْرِ عَن ذِكْرِ رَبِّي حَتَّىٰ تَوَارَتْ بِٱلْحِجَابِ ﴿٣٢﴾ رُدُّوهَا عَلَيَّۖ فَطَفِقَ مَسْحًۢا بِٱلسُّوقِ وَٱلْأَعْنَاقِ ﴿٣٣﴾ وَلَقَدْ فَتَنَّا سُلَيْمَٰنَ وَأَلْقَيْنَا عَلَىٰ كُرْسِيِّهِۦ جَسَدًا ثُمَّ أَنَابَ ﴿٣٤﴾ قَالَ رَبِّ ٱغْفِرْ لِي وَهَبْ لِي مُلْكًا لَّا يَنۢبَغِي لِأَحَدٍ مِّنۢ بَعْدِيٓۖ إِنَّكَ أَنتَ ٱلْوَهَّابُ ﴿٣٥﴾ فَسَخَّرْنَا لَهُ ٱلرِّيحَ تَجْرِي بِأَمْرِهِۦ رُخَآءً حَيْثُ أَصَابَ ﴿٣٦﴾ وَٱلشَّيَٰطِينَ كُلَّ بَنَّآءٍ وَغَوَّاصٍ ﴿٣٧﴾ وَءَاخَرِينَ مُقَرَّنِينَ فِي ٱلْأَصْفَادِ ﴿٣٨﴾ هَٰذَا عَطَآؤُنَا فَٱمْنُنْ أَوْ أَمْسِكْ بِغَيْرِ حِسَابٍ ﴿٣٩﴾ وَإِنَّ لَهُۥ عِندَنَا لَزُلْفَىٰ وَحُسْنَ مَـَٔابٍ ﴿٤٠﴾ وَٱذْكُرْ عَبْدَنَآ أَيُّوبَ إِذْ نَادَىٰ رَبَّهُۥٓ أَنِّي مَسَّنِيَ ٱلشَّيْطَٰنُ بِنُصْبٍ وَعَذَابٍ ﴿٤١﴾ ٱرْكُضْ بِرِجْلِكَۖ هَٰذَا مُغْتَسَلٌۢ بَارِدٌ وَشَرَابٌ ﴿٤٢﴾

(٢٧) ئێمە ئاسمان و زەوی و دروستکراوانی نێوانیانمان بێهودە و هەرەمەکی دروست نەکردووە، ئەوە بیرو باوەڕی ئەوانەیە کە بێ باوەڕ بوون، هاوار و ئاهوناڵە بۆ ئەوانەی کە کافر و بێبڕوان لە سزای ئاگری دۆزەخ.

(٢٨) نەخێر، ئەو باوەڕەیان هەڵەیە، بەڵکو ئایا ڕەوایە پاداشتی ئەوانەی ئیمان و باوەڕیان هێناوە و کاروکردەوە چاکەکانیان ئەنجام داوە، وەک ئەوانە لێ بکەین کە تۆوی خراپەیان چاندووە لە زەویدا، یاخود ئایا ئەوانەی پارێزکار و لە خواترسن وەک خراپەکاران سەیریان بکەین؟!

(٢٩) ئەم قورئانە کتێبێکی پیرۆزە دامانبەزاندووە بۆ لای تۆ، بۆ ئەوەی ئایەتەکانی لێک بدەنەوە و بیری لێ بکەنەوە و بۆ ئەوەی خاوەن بیرو هۆشەکان پەند و ئامۆژگاری وەربگرن و تێفکرن.

(٣٠) ئێمە سولەیمانمان بەخشی بە داود، ئای چ بەندەیەکی چاک بوو، چونکە بێگومان سولەیمان هەمیشە بەسۆزەوە داوای لێخۆشبوونی لە خوا دەکرد.

(٣١) کاتێک دەمەو ئێوارە ئەو ئەسپە چاکانەی کە ئامادە کرابوون بۆ غەزا هێنایان و نمایش کران لە پێش چاویدا.

(٣٢) ئینجا وتی: من هەمیشە حەز لەم جۆرە کارانە دەکەم و گرنگی بەم ئەسپانە بەخێر دەزانم، لەگەڵ ئەوەشدا نابێت ببنە هۆی ئەوەی کە لە یادی پەروەردگارم غافڵم بکەن و یادی فەرامۆش بکەم، ئەسپەکان غاریان کرد تا لە چاو ون بوون.

(٣٣) لەوەودوا سلێمان فەرمانیدا کە بیانگێڕنەوە و کە گەڕانەوە بۆ لای دەستی دەهێنا بە ران و ملیاندا (بەو شێوەیە خۆشەویستی خۆی دەردەبڕی بۆیان، چونکە ئەوانە هۆکارێکن بۆ غەزاو گەیاندنی ئایینی خوا).

(٣٤) سوێند بە خوا ئێمە سولەیمانمان تاقیکردەوە و ساوایەکی ناتەواومان فڕێدایە سەر تەختی فەرمانڕەوایەتیەکەی، پاشان گەڕایەوە بۆ لای خوا و پەنای بۆ ئێمە هێنا.. (چونکە بەبێ وتنی ـ إن شاء الله ـ بە ئومێدی چەند کوڕێک بوو).

(٣٥) وتی: پەروەردگارا لێم خۆش ببە و دەسەڵاتێکم پێببەخشە کە دەست نەدات بۆ کەسی تر لە دوای خۆم، چونکە بەڕاستی تەنها تۆ بەخشێنەری هەموو ناز و نیعمەتێکیت.

(٣٦) ئێمە نزامان گیراکرد و ـ با ـ مان بۆ رام هێنا، کە بەفەرمانی ئەو بەنەرمی هاتوچۆ بکات، بۆ هەر شوێنێک ویستی.

(٣٧) هەروەها شەیتانەکانیشمان کردە خزمەتگوزاری، لە هەموو جۆرە بیناسازێک و مەلەوانێکی ژێر دەریا.

(٣٨) هەندێکی تریش بەکۆت و زنجیر بەسترابوونەوە (تا نەتوانن خراپکاری ئەنجام بدەن).

(٣٩) ئەمە بەخششی ئێمەیە بۆ تۆ ئەی سولەیمان تۆش دەبەخشیت، یان نابەخشیت لێپرسینەوەت نیە و خۆت سەربەستی .

(٤٠) بێگومان سولەیمان لە لای ئێمە پلەی زۆر نزیکی هەیە و پاشەڕۆژ و ئایندەیەکی جوانی هەیە لای ئێمە .

(٤١) ئەی پێغەمبەر ﷺ سەرگوزەشتەی بەندەی ئێمە ـ ئەیوب ـ یان بۆ باس بکە، کاتێک بانگی لە پەروەردگاری کرد و وتی: بێگومان شەیتان تووشی نەخۆشی و ئازاری کردووم..

(٤٢) ئێمەش دۆعا و نزامان گیراکرد و وتمان: هەستە، بەپێی خۆت رابکە، ئەوە ئاوێکی سارده بۆ خۆشتن و خواردنەوە.

وَوَهَبْنَا لَهُۥٓ أَهْلَهُۥ وَمِثْلَهُم مَّعَهُمْ رَحْمَةً مِّنَّا وَذِكْرَىٰ لِأُوْلِى ٱلْأَلْبَٰبِ ﴿٤٣﴾ وَخُذْ بِيَدِكَ ضِغْثًا فَٱضْرِب بِّهِۦ وَلَا تَحْنَثْ ۗ إِنَّا وَجَدْنَٰهُ صَابِرًا ۚ نِّعْمَ ٱلْعَبْدُ ۖ إِنَّهُۥٓ أَوَّابٌ ﴿٤٤﴾ وَٱذْكُرْ عِبَٰدَنَآ إِبْرَٰهِيمَ وَإِسْحَٰقَ وَيَعْقُوبَ أُوْلِى ٱلْأَيْدِى وَٱلْأَبْصَٰرِ ﴿٤٥﴾ إِنَّآ أَخْلَصْنَٰهُم بِخَالِصَةٍ ذِكْرَى ٱلدَّارِ ﴿٤٦﴾ وَإِنَّهُمْ عِندَنَا لَمِنَ ٱلْمُصْطَفَيْنَ ٱلْأَخْيَارِ ﴿٤٧﴾ وَٱذْكُرْ إِسْمَٰعِيلَ وَٱلْيَسَعَ وَذَا ٱلْكِفْلِ ۖ وَكُلٌّ مِّنَ ٱلْأَخْيَارِ ﴿٤٨﴾ هَٰذَا ذِكْرٌ ۚ وَإِنَّ لِلْمُتَّقِينَ لَحُسْنَ مَـَٔابٍ ﴿٤٩﴾ جَنَّٰتِ عَدْنٍ مُّفَتَّحَةً لَّهُمُ ٱلْأَبْوَٰبُ ﴿٥٠﴾ مُتَّكِـِٔينَ فِيهَا يَدْعُونَ فِيهَا بِفَٰكِهَةٍ كَثِيرَةٍ وَشَرَابٍ ﴿٥١﴾ ۞ وَعِندَهُمْ قَٰصِرَٰتُ ٱلطَّرْفِ أَتْرَابٌ ﴿٥٢﴾ هَٰذَا مَا تُوعَدُونَ لِيَوْمِ ٱلْحِسَابِ ﴿٥٣﴾ إِنَّ هَٰذَا لَرِزْقُنَا مَا لَهُۥ مِن نَّفَادٍ ﴿٥٤﴾ هَٰذَا ۚ وَإِنَّ لِلطَّٰغِينَ لَشَرَّ مَـَٔابٍ ﴿٥٥﴾ جَهَنَّمَ يَصْلَوْنَهَا فَبِئْسَ ٱلْمِهَادُ ﴿٥٦﴾ هَٰذَا فَلْيَذُوقُوهُ حَمِيمٌ وَغَسَّاقٌ ﴿٥٧﴾ وَءَاخَرُ مِن شَكْلِهِۦٓ أَزْوَٰجٌ ﴿٥٨﴾ هَٰذَا فَوْجٌ مُّقْتَحِمٌ مَّعَكُمْ ۖ لَا مَرْحَبًۢا بِهِمْ ۚ إِنَّهُمْ صَالُواْ ٱلنَّارِ ﴿٥٩﴾ قَالُواْ بَلْ أَنتُمْ لَا مَرْحَبًۢا بِكُمْ ۖ أَنتُمْ قَدَّمْتُمُوهُ لَنَا ۖ فَبِئْسَ ٱلْقَرَارُ ﴿٦٠﴾ قَالُواْ رَبَّنَا مَن قَدَّمَ لَنَا هَٰذَا فَزِدْهُ عَذَابًا ضِعْفًا فِى ٱلنَّارِ ﴿٦١﴾



(٤٣) ئەوسا هەموو کەس و کاریمان پێبەخشی و ئەوەندەی تریش، ئەوە رەحمەت ومیهرەبانی تایبەتی بوو لەلایەن ئێمەوە، یاداوەریشە بۆ هەموو خاوەن بیرو هۆشەکان.

(٤٤) (ئەیوب ﷺ جارێک لە خێزانەکەی دڵی ئێشا، سوێندی خوارد کە ئەگەر چاک بۆوە چەند دارێکی لێبدات، خوای میهرەبانیش وەک رێزێک بۆ ئەو ئافرەتە وەفادارە فەرمانی پێدا): چەپکێ لاسکی ناسک بگرێت بەدەستەوە (بەقەدەر ئەو ژمارەیەی کە بریاری دابوو و بیماڵێت بە هاوسەرەکەیداو فەرمووی) سوێندەکەشت مەشکێنە، ئێمە بینیمان بەراستی خۆگر و نارامگر بوو، بەندەیەکی چاک و رێک و پێک بوو، بێگومان ئەو تەوبەکارە و هەمیشە دڵی لای پەروەردگارە.

(٤٥) ئەی پێغەمبەر ﷺ باس و یادی بەندە بەرێزەکانمان ئیبراهیم و ئیسحاق و یەعقوب بکە، هەموویان دەستێکی بالایان هەبوو لە گەیاندنی ئایینی خوادا، دەستێکی بالایان هەبوو لە چاکە و چاکەکاریدا، هەروەها بەرچاو روونی و شارەزایی تەواویان هەبو لە هەموو روویەکەوە.

(٤٦) ئێمە بەراستی کردمانن بەبەندەیەکی تایبەتی خۆمان بەهۆی سیفەتی دنیانەویستی کە ئەویش یادآوەری رۆژی قیامەتە.

(٤٧) بەراستی ئەوانە لای ئێمە لەو کەسانەن کە هەڵمان بژاردوون و پەسەندمان کردوون.

(٤٨) هەروەها باس و یادی ـ إسماعیل و الیسع و ذوالکفل ـ یشیان بۆ بکە کە هەریەکێک لەوانە لە هەڵبژاردە و پەسەندکراوەکانن.

(٤٩) ئەمانە هەمووی ناوبانگی ئەو پێغەمبەرە بەرێزانەیە و بێگومان بۆ پارێزکار و خواناسانیش چاکترین جێگە و رێگە و شوێنمان ئامادە کردووە.

(٥٠) باخەکانی بەهەشتی عەدنە، کە هەر هەموو دەروازەکانی لەسەر پشتە بۆیان.

(٥١) تیایدا بەئاسودەیی شانیان داداوە، بەردەوام داوای میوەی زۆر و خواردنەوەی هەمەجۆر دەکەن.

(٥٢) هەروەها حۆری هاوتەمەنی بە حەیاو شەرم لایانە، کە تەنها عاشقی هاوسەرەکانیانن و چاو بۆ کەسی تر هەڵنابڕن.

(٥٣) جا ئا ئەم بەڵێنی نازو نیعمەتەی پێتان دراوە لە رۆژی پاداشتدا بۆتان ئامادەیە.

(٥٤) بەراستی ئەمە رزق و رۆزیمانە بۆ بەختەوەران، هەرگیز تەواو نابێت و کۆتایی نایەت.

(٥٥) ئەمەی باسکرا بۆ ئیماندارانە، بەلام بۆ ستەمکار و یاخی بووەکان، بەراستی ناخۆشترین جێگە و رێگە ئامادەیە.

(٥٦) دۆزەخە، کە دەگیەنرێنە ناوی، کەواتە ئای چ شوێنێکی ناساز و سەخت و ناسۆرە.

(٥٧) ئەمە و؛ دەبا هەر بچێژن و بخۆن لە ئاو و خۆراکی زۆر گەرم و کێم و زووخاوی داچۆڕاو..

(٥٨) شتی تریش لەو بابەتانە هەمەجۆر دەرخواردیان دەدرێت.

(٥٩) (کاتێک ستەمکاران بەرەو دۆزەخ راپێچ دەکرێن هەندێ فریشتە پێیان دەڵێن:) ئەوە تاقمێکە لەگەڵ ئێوەدا پاڵەپەستۆیانە، ئەوانیش دەڵێن: دەک بەخێر نەیەن، ئەوانیش دەبێت بگەیەنرێنە دۆزەخ و بچنە ناو ئاگرەوە.

(٦٠) لە وەلامیاندا دەڵێن: نەخێر ئێوە بەخێر نەیەنەوە، ئێوە ئەم شوێنەتان بۆ ئێمە مسۆگەر کرد ئای کە جێگەیەکی ناساز و ناخۆشە.

(٦١) دوایی بەدەم ئاهو ناڵەوە دەڵێن : پەروەردگارا ئەوەی بوو بەهۆی ئەوەی کە ئا ئەم شوێنە بەنسیبی ئێمە ببێت، سزای چەند بەرابەری لەناو دۆزەخدا بۆ پێش بهێنە.

وَقَالُوا مَا لَنَا لَا نَرَىٰ رِجَالًا كُنَّا نَعُدُّهُم مِّنَ الْأَشْرَارِ ﴿٦٢﴾ أَتَّخَذْنَاهُمْ سِخْرِيًّا أَمْ زَاغَتْ عَنْهُمُ الْأَبْصَارُ ﴿٦٣﴾ إِنَّ ذَٰلِكَ لَحَقٌّ تَخَاصُمُ أَهْلِ النَّارِ ﴿٦٤﴾ قُلْ إِنَّمَا أَنَا مُنذِرٌ ۖ وَمَا مِنْ إِلَٰهٍ إِلَّا اللَّهُ الْوَاحِدُ الْقَهَّارُ ﴿٦٥﴾ رَبُّ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَمَا بَيْنَهُمَا الْعَزِيزُ الْغَفَّارُ ﴿٦٦﴾ قُلْ هُوَ نَبَأٌ عَظِيمٌ ﴿٦٧﴾ أَنتُمْ عَنْهُ مُعْرِضُونَ ﴿٦٨﴾ مَا كَانَ لِيَ مِنْ عِلْمٍ بِالْمَلَإِ الْأَعْلَىٰ إِذْ يَخْتَصِمُونَ ﴿٦٩﴾ إِن يُوحَىٰ إِلَيَّ إِلَّا أَنَّمَا أَنَا نَذِيرٌ مُّبِينٌ ﴿٧٠﴾ إِذْ قَالَ رَبُّكَ لِلْمَلَائِكَةِ إِنِّي خَالِقٌ بَشَرًا مِّن طِينٍ ﴿٧١﴾ فَإِذَا سَوَّيْتُهُ وَنَفَخْتُ فِيهِ مِن رُّوحِي فَقَعُوا لَهُ سَاجِدِينَ ﴿٧٢﴾ فَسَجَدَ الْمَلَائِكَةُ كُلُّهُمْ أَجْمَعُونَ ﴿٧٣﴾ إِلَّا إِبْلِيسَ اسْتَكْبَرَ وَكَانَ مِنَ الْكَافِرِينَ ﴿٧٤﴾ قَالَ يَا إِبْلِيسُ مَا مَنَعَكَ أَن تَسْجُدَ لِمَا خَلَقْتُ بِيَدَيَّ ۖ أَسْتَكْبَرْتَ أَمْ كُنتَ مِنَ الْعَالِينَ ﴿٧٥﴾ قَالَ أَنَا خَيْرٌ مِّنْهُ ۖ خَلَقْتَنِي مِن نَّارٍ وَخَلَقْتَهُ مِن طِينٍ ﴿٧٦﴾ قَالَ فَاخْرُجْ مِنْهَا فَإِنَّكَ رَجِيمٌ ﴿٧٧﴾ وَإِنَّ عَلَيْكَ لَعْنَتِي إِلَىٰ يَوْمِ الدِّينِ ﴿٧٨﴾ قَالَ رَبِّ فَأَنظِرْنِي إِلَىٰ يَوْمِ يُبْعَثُونَ ﴿٧٩﴾ قَالَ فَإِنَّكَ مِنَ الْمُنظَرِينَ ﴿٨٠﴾ إِلَىٰ يَوْمِ الْوَقْتِ الْمَعْلُومِ ﴿٨١﴾ قَالَ فَبِعِزَّتِكَ لَأُغْوِيَنَّهُمْ أَجْمَعِينَ ﴿٨٢﴾ إِلَّا عِبَادَكَ مِنْهُمُ الْمُخْلَصِينَ ﴿٨٣﴾

(٦٢) هەروەها دەڵێن: ئەوە چیمانە بۆچی ئێمە کسانێک نابینین کە کاتی خۆی بە خراپ و دواکەتوو کۆنەپەرست دەماندانە قەڵەم.

(٦٣) کاتی خۆی گاڵتەمان پێ دەکردن، توانجمان تێدەگرتن، کەچی ئەمڕۆ یان لێرە نین، یان بەرچاومان لێڵ و تاریکە و نایانبینین!!

(٦٤) بەڕاستی ئەوە بەسەرهات و کێشمەکێش و دەمەدەمێی دۆزەخیەکانە و حەقیقەت و ڕاستەقینەیە و بۆیان پێش دێت.

(٦٥) ئەی پێغەمبەر ﷺ پێیان بڵێ بەڕاستی من تەنها بێدارکەرەوەم، کە جگەلە خوای تاکو تەنها و بەدەسەڵات و خەشمگیر لە تاوانباران هیچ خوایەکی تر نیە.

(٦٦) ئەو خوایە پەروەردگاری ئاسمانەکان و زەوی و هەموو دروستکراوانی نێوانیانە، باڵادەستە بەسەر کافراندا، لێخۆشبووە و چاوپۆشی دەکات لە ئیمانداران.

(٦٧) پێیان بڵێ: ئەم هەواڵ و دەنگ و باسانە هەواڵ و دەنگ و باسێکی زۆر گەورە و گرنگن.

(٦٨) بەڵام ئێوە پشتی تێدەکەن و گوێی بۆ ناگرن.

(٦٩) خۆ من (مەبەست پێغەمبەرە) هیچ ئاگاداری ئەوە نەبووم کەچی گوزەراوە لە شوێنە بڵندەکاندا کاتێک کە فریشتەکان کێشەیان هەبوو لە جێنشینی ئادەمدا.

(٧٠) وەحی و نیگام بۆ نایەت تەنها لەبەر ئەوە نەبێت کە من بێدارکەرەوەیەکی ئاشکرام.

(٧١) کێشەی فریشتەکان کاتێک بوو کە پەروەردگارت پێی وتن: من دەمەوێت بەشەرێک، لە قوڕ دروست بکەم.

(٧٢) جا کاتێک دروستم کرد و لەو گیان و ڕۆحەی کە من خاوەنی ئەوم، فووم پێداکردو گیان و ژیانم پێبەخشی ئێوەی فریشتە هەمووتان سووژدەی (ڕێزو تەقدیری بەفەرمانی من) بۆ بەرن.

(٧٣) هەموو فریشتەکان فەرمانی خوایان بەجێ هێنا و سووژدەیان برد.

(٧٤) جگە لە ئیبلیس نەبێت کە لەو کاتەدا لەناو فریشتەکاندا بوو فووی کردە خۆی و خۆی بەگەورە زانی و خۆی خستە ڕیزی کافرانەوە.

(٧٥) خوا فەرمووی: ئەی ئیبلیس ئەوە چی نەیهێشت و نایەڵێت سوژدە بەریت بۆ ئەو کەسەی کە بە دوو دەستی قودرەتی خۆم دروستم کردووە؟! ئایا خۆتت بەگەورە زانی یان هەر لە زووەوە خۆت بەشت دەزانیت و خۆت لا بەرزو گەورەیە.

(٧٦) شەیتان وتی: من لەو چاکترو بەنرختر و پیرۆزترم، چونکە تۆ منت لە ئاگر دروست کردووە و ئەوت لە قوڕ بەدیهێناوە.

(٧٧) خوا فەرمووی: مادەم وایە دەرچۆ لە بەهەشت و بەجێی بهێڵە چونکە تۆ ئیتر ڕەجم کراوو دوورخراوەیت لە ڕەحمەتی من.

(٧٨) بەڕاستی لەعنەت و نەفرینی منت لەسەرە تا ڕۆژی قیامەت (چونکە تۆ فەرمانی منت جێبەجێ نەکرد).

(٧٩) شەیتان وتی: پەروەردگارا دەی کەواتە مۆڵەتم بدە تا ئەو ڕۆژەی کە نەوەکانی ئادەم زیندوو دەکرێنەوە.

(٨٠) خوا فەرمووی: باشە تۆ لە مۆڵەت دراوانیت... (٨١) تا ڕۆژو کاتی دیاریکراو.

(٨٢) ئینجا شەیتان وتی: سوێند بەدەسەڵاتی بێسنوورت شەرت بێت هەر هەموویان گومڕاو سەرگەردان بکەم.

(٨٣) جگە لە بەندە و عەبدە دڵسۆزەکانت کە هەڵبژاردەی خۆتن (دەسەڵاتی ئەوانم نیە).

قَالَ فَالْحَقُّ وَالْحَقَّ أَقُولُ ﴿٨٤﴾ لَأَمْلَأَنَّ جَهَنَّمَ مِنكَ وَمِمَّن تَبِعَكَ مِنْهُمْ أَجْمَعِينَ ﴿٨٥﴾ قُلْ مَآ أَسْـَٔلُكُمْ عَلَيْهِ مِنْ أَجْرٍ وَمَآ أَنَا۠ مِنَ ٱلْمُتَكَلِّفِينَ ﴿٨٦﴾ إِنْ هُوَ إِلَّا ذِكْرٌ لِّلْعَٰلَمِينَ ﴿٨٧﴾ وَلَتَعْلَمُنَّ نَبَأَهُۥ بَعْدَ حِينٍۭ ﴿٨٨﴾

سُورَةُ الزُّمَرِ

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

تَنزِيلُ ٱلْكِتَٰبِ مِنَ ٱللَّهِ ٱلْعَزِيزِ ٱلْحَكِيمِ ﴿١﴾ إِنَّآ أَنزَلْنَآ إِلَيْكَ ٱلْكِتَٰبَ بِٱلْحَقِّ فَٱعْبُدِ ٱللَّهَ مُخْلِصًا لَّهُ ٱلدِّينَ ﴿٢﴾ أَلَا لِلَّهِ ٱلدِّينُ ٱلْخَالِصُ ۚ وَٱلَّذِينَ ٱتَّخَذُوا۟ مِن دُونِهِۦٓ أَوْلِيَآءَ مَا نَعْبُدُهُمْ إِلَّا لِيُقَرِّبُونَآ إِلَى ٱللَّهِ زُلْفَىٰٓ إِنَّ ٱللَّهَ يَحْكُمُ بَيْنَهُمْ فِى مَا هُمْ فِيهِ يَخْتَلِفُونَ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَهْدِى مَنْ هُوَ كَٰذِبٌ كَفَّارٌ ﴿٣﴾ لَّوْ أَرَادَ ٱللَّهُ أَن يَتَّخِذَ وَلَدًا لَّٱصْطَفَىٰ مِمَّا يَخْلُقُ مَا يَشَآءُ ۚ سُبْحَٰنَهُۥ ۖ هُوَ ٱللَّهُ ٱلْوَٰحِدُ ٱلْقَهَّارُ ﴿٤﴾ خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ بِٱلْحَقِّ ۖ يُكَوِّرُ ٱلَّيْلَ عَلَى ٱلنَّهَارِ وَيُكَوِّرُ ٱلنَّهَارَ عَلَى ٱلَّيْلِ ۖ وَسَخَّرَ ٱلشَّمْسَ وَٱلْقَمَرَ ۖ كُلٌّ يَجْرِى لِأَجَلٍ مُّسَمًّى ۗ أَلَا هُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْغَفَّٰرُ ﴿٥﴾

(٨٤) پەروەردگار فەرمووی: من خۆم حەق و راستیم و هەر حەق و راستیش دەڵێم.

(٨٥) سوێند بەزاتی خۆم دەبێت دۆزەخ پڕ بکەم لە تۆو لە هەموو ئەوانەی کە شوێنی تۆ دەکەون.

(٨٦) جا تۆش ئەی پێغەمبەر ﷺ بەو خەڵکە بڵێ: من هیچ پاداشت و خەڵاتێکم لە ئێوە ناوێت، من لەو کەسانەش نیم کە شت هەڵبەستم و زۆر لە خۆ بکەم .

(٨٧) ئەم قورئانە تەنها ئامۆژگاریە بۆ هەموو خەڵکی جیهان لە هەموو کات و شوێنێکدا.

(٨٨) بەراستی لە داهاتوویەکی نزیکدا، هەر لە دنیادا هەواڵی راستی و دروستی ئەم ئایینە دەزانن، لە قیامەتیشدا هەموو شتێک بە تەواوی ئاشکراو روون دەبێت.

سوورەتی (الزمـر)

بەناوی خوای بەخشندە و میهرەبان

(١) هاتنە خوارەوەی ئەم قورئانە لەلایەن خوای بالادەست و داناوەیە.

(٢) بێگومان ئێمە ئەم قورئانەمان رەوانە کردووە بۆ تۆ ئەی پێغەمبەرﷺ تا حەق و راستی روون بکاتەوە، کەواتە هەر خوا بپەرستە و هەر ملکەچو دڵسۆزبە بۆ ئاین و بەرنامەکەی.

(٣) ئاگاداربن: دینی پاک و خاوێن تەنها بۆ خوایە، ئەوانەش جگە لەو زاتە کەسانی ترو شتی تر دەکەنە پشتیوانی خۆیان دەڵێن: ئێمە ئەم بت و شتانە ناپەرستین تەنها لەبەر ئەوەی لە خوا نزیکمان بخەنەوە، لەکاتێکدا ئەوان لەخواوە نزیکترن، بێگومان خوا داوەری دەکات لە نێوانیاندا، لەو شتانەدا کە کێشەیان لەسەری هەیەو رایان دەربارەی جۆراو جۆرە، بەڕاستی خوا ئەو بیروباوەرە چەوتەیان لێوەرناگرێت و هیدایەت و رێنموویی ئەو کەسانە ناکات کە درۆزن و بێباوەڕن.

(٤) ئەگەر خوا بیویستایە رۆڵەیەک بۆ خۆی بڕیار بدات، ئەوا لە نێوان ئەو شتانەدا کە دروستی کردووە شتێکی هەڵدەبژاردکە بەویستی خۆی بوایە نەک بەویستی ئەوان، پاکی و بێگەردی بۆ ئەو زاتەیە کە دوورە لە شتی ناڕەوا نابەجێ، ئەو زاتە خوایەکی تاک و تەنهاو زۆر بەدەسەڵاتە (تۆڵەدەسێنێت لەوانەی دژایەتی دەکەن و نایپەرستن).

(٥) ئاسمانەکان و زەوی لەسەر بنچینەی حەق و راستی دروست کردووە، بەشێوەی کەوانەیی شەو بەسەر رۆژدا دەهێنێت، بەهەمان شێوەی کەوانەیی رۆژیش بەسەر شەودا دەهێنێت (کە ئەمە خۆی بەڵگەیەکی قورئانیە لەسەر شێوازی خڕی زەوی)، رۆژو مانگیشی رام کردووە و رای هێناون (لە فەرمانی دەرناچن و لەخزمەتی ئادەمیزادان)، هەریەک لەوانە لەچەرخ و خولدان تا کاتێکی دیاریکراو، ئاگاداربن: هەرئەو خوایە زۆر بەدەسەڵاتە (تۆڵە لە کافران دەسێنێت و لەدەستی دەرناچن) و لێخۆشبووە (چاوپۆشی دەکات لە هەڵەو کەم و کووڕی ئیمانداران).

خَلَقَكُم مِّن نَّفْسٍ وَٰحِدَةٍ ثُمَّ جَعَلَ مِنْهَا زَوْجَهَا وَأَنزَلَ لَكُم مِّنَ ٱلْأَنْعَٰمِ ثَمَٰنِيَةَ أَزْوَٰجٍ يَخْلُقُكُمْ فِى بُطُونِ أُمَّهَٰتِكُمْ خَلْقًا مِّنۢ بَعْدِ خَلْقٍ فِى ظُلُمَٰتٍ ثَلَٰثٍ ذَٰلِكُمُ ٱللَّهُ رَبُّكُمْ لَهُ ٱلْمُلْكُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ فَأَنَّىٰ تُصْرَفُونَ ﴿٦﴾ إِن تَكْفُرُوا۟ فَإِنَّ ٱللَّهَ غَنِىٌّ عَنكُمْ وَلَا يَرْضَىٰ لِعِبَادِهِ ٱلْكُفْرَ وَإِن تَشْكُرُوا۟ يَرْضَهُ لَكُمْ وَلَا تَزِرُ وَازِرَةٌ وِزْرَ أُخْرَىٰ ثُمَّ إِلَىٰ رَبِّكُم مَّرْجِعُكُمْ فَيُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ إِنَّهُۥ عَلِيمٌۢ بِذَاتِ ٱلصُّدُورِ ﴿٧﴾ ۞ وَإِذَا مَسَّ ٱلْإِنسَٰنَ ضُرٌّ دَعَا رَبَّهُۥ مُنِيبًا إِلَيْهِ ثُمَّ إِذَا خَوَّلَهُۥ نِعْمَةً مِّنْهُ نَسِىَ مَا كَانَ يَدْعُوٓا۟ إِلَيْهِ مِن قَبْلُ وَجَعَلَ لِلَّهِ أَندَادًا لِّيُضِلَّ عَن سَبِيلِهِۦ قُلْ تَمَتَّعْ بِكُفْرِكَ قَلِيلًا إِنَّكَ مِنْ أَصْحَٰبِ ٱلنَّارِ ﴿٨﴾ أَمَّنْ هُوَ قَٰنِتٌ ءَانَآءَ ٱلَّيْلِ سَاجِدًا وَقَآئِمًا يَحْذَرُ ٱلْءَاخِرَةَ وَيَرْجُوا۟ رَحْمَةَ رَبِّهِۦ قُلْ هَلْ يَسْتَوِى ٱلَّذِينَ يَعْلَمُونَ وَٱلَّذِينَ لَا يَعْلَمُونَ إِنَّمَا يَتَذَكَّرُ أُو۟لُوا۟ ٱلْأَلْبَٰبِ ﴿٩﴾ قُلْ يَٰعِبَادِ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱتَّقُوا۟ رَبَّكُمْ لِلَّذِينَ أَحْسَنُوا۟ فِى هَٰذِهِ ٱلدُّنْيَا حَسَنَةٌ وَأَرْضُ ٱللَّهِ وَٰسِعَةٌ إِنَّمَا يُوَفَّى ٱلصَّٰبِرُونَ أَجْرَهُم بِغَيْرِ حِسَابٍ ﴿١٠﴾



(٦) خەڵكینە بیرتان نەچێت خوا ئێوەی لە تاکە نەفسێکێ هێناوەتە کایەوە لەوەودوا لەو تاکە نەفسە هاوسەرەکەشی فەراهەم هێناوە، لە مالاتیشدا هەشت جۆری دروست کردووە(لە ئایەتی ـ ١٤٣، ١٤٤ـ لە سوورەتی ـ الانعام ـ دا ئاماژەی بۆ کردووە)، لەوەودوا لە سکی دایکتاندا ئێوە دروست دەکات بەچەند قۆناغێک، لەناو سێ تاریکیدا (مەبەست سێ پێستەکەیە کە کۆرپەلەی تێدا حەشاردراوە)، جا گۆڕانکاری بەردەوامە و گەورە بوون و جیابوونەوەی ئەندامەکان (ڕۆژ لە دوای ڕۆژ زیاتر روو دەدات) ئا ئەوەیە خوا، ئا ئەوەیە پەروەردگارتان، خاوەنی هەموو بەدیهێنراوەکانە جگە لەو خوایەکی تر نیە، جا ئیتر بۆ کوێ لادەدرێن لە خواپەرستی ؟!

(٧) ئەگەر خۆتان بێباوەڕ بکەن، بێگومان خوا بێنیازە لێتان، هەرچەندە رازی نابێت کە بەندەکانی بێباوەڕ بن و ڕێبازی خوانەناسی بگرن، بەڵام ئەگەر ڕێبازی سوپاسگوزاری بگرنە بەر، بەو کارەتان رازی دەبێت، دڵنیاش بن کە هیچ کەس کۆڵی گوناهی کەسی تر هەڵناگرێت، پاشان گەڕانەوەتان بۆ لای پەروەردگارتانە، ئەوسا هەواڵی هەموو ئەو کاروکردەوانەتان پێدەدا کە ئەنجامتان دەدا، چونکە ئەو زاتە زانایە بە هەموو ئەو شتانەی، لە سینە ودڵ و دەروونەکاندا حەشاردراون.

(٨) ئادەمیزاد کاتێک ناخۆشی و زەرەرێکی تووشهات، هانا و هاوار بۆ پەروەردگاری دەبات و بەدڵشکاوی لێی دەلاڵێتەوە، پاشان کاتێک خوا دەرووی لێ کردەوە و ناز و نیعمەتی پێبەخشی، دۆعا و نزا و هانا و هاوارەکانی ئەوسای فەرامۆش دەکات، چەندەها هاوەڵ و شەریک بۆ خوا بڕیار دەدات، دەیەوێت خەڵکی لە ڕێبازی خوا وێڵ بکات، ئەی پێغەمبەر ﷺ بەو جۆرە کەسە بڵێ: کەمێک بە خوانەناسی رابوێرە، بەڵام دڵنیابە کە تۆ نیشتەجێی ناو ئاگری دۆزەخیت.

(٩) (ئایا ئەو جۆرە کەسانەی کە باسکران چاکترن) یان ئەو ئیماندارەی کە لە دووتوێی شەوگاردا هەڵدەستێت بۆ خواپەرستی، سوژدە دەبات و بەپێوە دەوەستێت، لە لێپرسینەوەی قیامەت دەترسێت و ئومێد و هیوای بەمیهرەبانی پەروەردگاری هەیە، ئەی پێغەمبەر ﷺ بڵێ: ئایا ئەو کەسانەی کە دەزانن وشارەزان، وەک ئەوانەن کە هیچ نازانن و شارەزاییان نیە؟، بەڕاستی تەنها خاوەن بیروهۆشەکان لەم جۆرە یاداوەریانە سوود وەردەگرن و تێدەگەن (لە حەقیقەتی دنیا وقیامەت، وە دڵنیان ژیانی دنیا فرسەتێکی بەنرخە و بۆ بەدەستهێنانی رەزامەندی خوا بەکاری دەهێنن).

(١٠) بەو بەندانەم بڵێ کە خاوەن باوەڕن: لە پەروەردگارتان بترسن و خواناس بن، بێگومان بۆ ئەوانەی لەم دنیایەدا چاکە دەکەن، پاداشتی چاک هەیە، زەوی پەروەردگاریش فراوانە (ئەگەر لە شوێنێک دنیاتان لێ تەنگ کرایەوە کۆچ بکەن بۆ شوێنێکی تر) بەڕاستی تەنها خۆگران پاداشتیان بێسنوور و بێ ئەندازەیە.

قُلْ إِنِّيٓ أُمِرْتُ أَنْ أَعْبُدَ ٱللَّهَ مُخْلِصًا لَّهُ ٱلدِّينَ ﴿١١﴾ وَأُمِرْتُ لِأَنْ أَكُونَ أَوَّلَ ٱلْمُسْلِمِينَ ﴿١٢﴾ قُلْ إِنِّيٓ أَخَافُ إِنْ عَصَيْتُ رَبِّي عَذَابَ يَوْمٍ عَظِيمٍ ﴿١٣﴾ قُلِ ٱللَّهَ أَعْبُدُ مُخْلِصًا لَّهُۥ دِينِي ﴿١٤﴾ فَٱعْبُدُوا۟ مَا شِئْتُم مِّن دُونِهِۦ ۗ قُلْ إِنَّ ٱلْخَٰسِرِينَ ٱلَّذِينَ خَسِرُوٓا۟ أَنفُسَهُمْ وَأَهْلِيهِمْ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ ۗ أَلَا ذَٰلِكَ هُوَ ٱلْخُسْرَانُ ٱلْمُبِينُ ﴿١٥﴾ لَهُم مِّن فَوْقِهِمْ ظُلَلٌ مِّنَ ٱلنَّارِ وَمِن تَحْتِهِمْ ظُلَلٌ ۚ ذَٰلِكَ يُخَوِّفُ ٱللَّهُ بِهِۦ عِبَادَهُۥ ۚ يَٰعِبَادِ فَٱتَّقُونِ ﴿١٦﴾ وَٱلَّذِينَ ٱجْتَنَبُوا۟ ٱلطَّٰغُوتَ أَن يَعْبُدُوهَا وَأَنَابُوٓا۟ إِلَى ٱللَّهِ لَهُمُ ٱلْبُشْرَىٰ ۚ فَبَشِّرْ عِبَادِ ﴿١٧﴾ ٱلَّذِينَ يَسْتَمِعُونَ ٱلْقَوْلَ فَيَتَّبِعُونَ أَحْسَنَهُۥٓ ۚ أُو۟لَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ هَدَىٰهُمُ ٱللَّهُ ۖ وَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمْ أُو۟لُوا۟ ٱلْأَلْبَٰبِ ﴿١٨﴾ أَفَمَنْ حَقَّ عَلَيْهِ كَلِمَةُ ٱلْعَذَابِ أَفَأَنتَ تُنقِذُ مَن فِى ٱلنَّارِ ﴿١٩﴾ لَٰكِنِ ٱلَّذِينَ ٱتَّقَوْا۟ رَبَّهُمْ لَهُمْ غُرَفٌ مِّن فَوْقِهَا غُرَفٌ مَّبْنِيَّةٌ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ ۖ وَعْدَ ٱللَّهِ ۖ لَا يُخْلِفُ ٱللَّهُ ٱلْمِيعَادَ ﴿٢٠﴾ أَلَمْ تَرَ أَنَّ ٱللَّهَ أَنزَلَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءً فَسَلَكَهُۥ يَنَٰبِيعَ فِى ٱلْأَرْضِ ثُمَّ يُخْرِجُ بِهِۦ زَرْعًا مُّخْتَلِفًا أَلْوَٰنُهُۥ ثُمَّ يَهِيجُ فَتَرَىٰهُ مُصْفَرًّا ثُمَّ يَجْعَلُهُۥ حُطَٰمًا ۚ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَذِكْرَىٰ لِأُو۟لِى ٱلْأَلْبَٰبِ ﴿٢١﴾

(١١) هـەروەها ئـەی پێغەمبـەرﷺ پێیـان بڵـێ: بەراستی من فەرمانم پێدراوە هەر خـوا بپەرستم و لە هەموو ژیانمدا ملکەچ و فەرمانبەرداری دیـن و ئاین و بەرنامەی ئەو بم.

(١٢) فەرمانیشم پێدراوە کە یەکەمین کەس بم لە خواپەرستی و ئیسلامەتی و دینداریدا.

(١٣) هـەروەها بڵێ: مـن زۆر دەترسم لـە سـزای رۆژێکی پڕمەترسـی و سـامناک، بەتایبـەت ئەگـەر سەرکەشی بکەم لە فەرمانی پەروەردگارم.

(١٤) بڵێ: من تەنها هەر خوا دەپەرستم و ملکەچ و فەرمانبەرداری ئاین و بەرنامەکەی ئەو دەبم.

(١٥) جا ئێـوەش ئـەی بێبـاوەڕان چی دەپەرستن جگە لەو خوایە، بیپەرستن و پێیان بڵـێ: بێگومـان خەسارەتمەندان ئـەو کەسـانەن خۆیـان و خـاو و خێزانیان لە دەستچووە لە رۆژی قیامـەتدا، ئاگـادار بـن: کـە بەراسـتی هـەر ئەوەیـە خەسـارەتمەندی ئاشکراو زیانی دیارو روون.

(١٦) ئەوانە لە سەروویانەوە پەڵە هەوری دووکەڵ لە ئـاگر دەورەی داون، لـە ژێریشـیانەوە هـەمان پەڵـە هەور و دووکەڵ هەیە، ئاوەو شـێوەیە خـوای گـەورە بەندەکانی دەترسێنێت و پێیـان دەفـەرموێت: ئـەی بەندەکانم پارێزکاربن و خۆتان لە سزای من بپارێزن.

(١٧) جا ئەوانەی کە خۆیـان دوورە پـەرێز گرتـووە لە هەموو ئەو شتانەی خەڵکی دەیپەرستن، جگە لە خـوای پـەروەردگار و بەتەوبـە و پەشـیمانیەوە گەڕاونەتەوە بۆلای خوا، مژدەی سەرکەوتن و سەرفرازی و بەختەوەری و کامەرانی بۆ ئەوانەیە، دە مژدە بدە بەو بەندانەم...

(١٨) ئەوانەی گوێ بۆ قسەو گوفتار دەگرن و پەیڕەوی چاکترینی دەکەن، ئا ئەوانـە کەسـانێکن کـە خـوا هیدایـەت و رێنموویی کردوون، ئەوانە خاوەنی عـەقڵ و ژیری و بیروهۆشن.

(١٩) جا ئایا ئەو کەسەی کـە بـەهۆی خراپـی و خوانەناسیەوە بڕیـاری سزادانی دراب‌ێـت(تـۆ هـیـچ کاروبـاری ئـەوت بەدەستە).. ئایا تۆ دەتوانیت ئەو جۆرە کەسانە رزگار بکەیت کە لەناو ئاگری دۆزەخدا گیریان خواردووە؟!

(٢٠) بەڵام ئەوانەی کە لـە پـەروەردگاریان دەترسـان و دینـدار بـوون کۆشـک و تـەلاری چـەند نـهۆم کـە ژوورەکـانی لەسەریەکن بۆیـان ئامادەیـە، چـەندەها روبـار بـەژێرو بـە بـەردەم ئـەو کۆشـکانەدا جاریـە، ئـەوەش بـەڵێنی خوایـە، بێگومان خوایش بەڵێنی خۆی دەباتە سەر.

(٢١) ئایا تۆ نـەتبینیوەو سەرنجت نەداوە: بەراستی خـوا لـە ئاسمانـەوە بـارانی بـاراندووە، لـەوەودوا لـەناو نـاخی زەویدا کۆی دەکاتەوە، پاشان بەشێوەی کارێز وکـانی دەریدەهێنێت، ئەوسـا هـەر بـەو ئـاوە کشـتوکاڵی هەمـەجۆر و هەمـەرەنگ دەروێنێت، ئینجا دەبینیت وشک دەبێت و زەرد هەڵدەگـەرێت، پاشـان دەیخـات و وردو خاشـی دەکـات، جا بەڕاستی ئا لەو شتانەدا یاداوەری و یادخستنەوە هەیە بۆ کەسانی ژیرو هۆشمەند.

أَفَمَن شَرَحَ ٱللَّهُ صَدۡرَهُۥ لِلۡإِسۡلَٰمِ فَهُوَ عَلَىٰ نُورٖ مِّن رَّبِّهِۦۚ فَوَيۡلٞ لِّلۡقَٰسِيَةِ قُلُوبُهُم مِّن ذِكۡرِ ٱللَّهِۚ أُوْلَٰٓئِكَ فِي ضَلَٰلٖ مُّبِينٍ ﴿٢٢﴾ ٱللَّهُ نَزَّلَ أَحۡسَنَ ٱلۡحَدِيثِ كِتَٰبٗا مُّتَشَٰبِهٗا مَّثَانِيَ تَقۡشَعِرُّ مِنۡهُ جُلُودُ ٱلَّذِينَ يَخۡشَوۡنَ رَبَّهُمۡ ثُمَّ تَلِينُ جُلُودُهُمۡ وَقُلُوبُهُمۡ إِلَىٰ ذِكۡرِ ٱللَّهِۚ ذَٰلِكَ هُدَى ٱللَّهِ يَهۡدِي بِهِۦ مَن يَشَآءُۚ وَمَن يُضۡلِلِ ٱللَّهُ فَمَا لَهُۥ مِنۡ هَادٍ ﴿٢٣﴾ أَفَمَن يَتَّقِي بِوَجۡهِهِۦ سُوٓءَ ٱلۡعَذَابِ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِۚ وَقِيلَ لِلظَّٰلِمِينَ ذُوقُواْ مَا كُنتُمۡ تَكۡسِبُونَ ﴿٢٤﴾ كَذَّبَ ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِهِمۡ فَأَتَىٰهُمُ ٱلۡعَذَابُ مِنۡ حَيۡثُ لَا يَشۡعُرُونَ ﴿٢٥﴾ فَأَذَاقَهُمُ ٱللَّهُ ٱلۡخِزۡيَ فِي ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَاۖ وَلَعَذَابُ ٱلۡأٓخِرَةِ أَكۡبَرُۚ لَوۡ كَانُواْ يَعۡلَمُونَ ﴿٢٦﴾ وَلَقَدۡ ضَرَبۡنَا لِلنَّاسِ فِي هَٰذَا ٱلۡقُرۡءَانِ مِن كُلِّ مَثَلٖ لَّعَلَّهُمۡ يَتَذَكَّرُونَ ﴿٢٧﴾ قُرۡءَانًا عَرَبِيًّا غَيۡرَ ذِي عِوَجٖ لَّعَلَّهُمۡ يَتَّقُونَ ﴿٢٨﴾ ضَرَبَ ٱللَّهُ مَثَلٗا رَّجُلٗا فِيهِ شُرَكَآءُ مُتَشَٰكِسُونَ وَرَجُلٗا سَلَمٗا لِّرَجُلٍ هَلۡ يَسۡتَوِيَانِ مَثَلًاۚ ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِۚ بَلۡ أَكۡثَرُهُمۡ لَا يَعۡلَمُونَ ﴿٢٩﴾ إِنَّكَ مَيِّتٞ وَإِنَّهُم مَّيِّتُونَ ﴿٣٠﴾ ثُمَّ إِنَّكُمۡ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ عِندَ رَبِّكُمۡ تَخۡتَصِمُونَ ﴿٣١﴾

جا ئایا ئەو کەسەی کە خوای میهرەبان سینەی گوشاد کردووە بۆ ئیسلام و لەسەر ڕێبازی نووروو روناکی پەروەردگاریەتی، (وەک ئەو کەسە وایە کە پێچەوانەیە؟) هاوار و وەیل بۆ ئەوانەی کە دڵیان رەقە لە ئاستی قورئان و یادی خوادا، ئا ئەوانە لە گومڕاییەکی ئاشکرادا گیریان خواردووە.

(٢٣) خوا ﷻ جوانترین و پیرۆزترین فەرمایشتی ناردۆتە خوارەوە کە ئەم قورئانەیە، (لە جوانی دارشتندا) بابەتەکانی لە یەک دەچن، هەندێک باسیشی بەشێوازی جیاواز تیادا دووبارە بۆتەوە، جا کارکردی ئەم قورئانە ئەوەیەکە: تەزوو دەهێنێت بە گیان و پێستی ئەوکەسانەدا کە ترسی پەروەردگاریان لە دڵ و دەروونْدا هەیە، پاشان گیان و پێست و دڵیان نەرم و ئامادە و چالاک دەبێت بۆ یادی خواو خواپەرستی ئا ئەوە هیدایەت و ڕێنموویی خوایە کە هەر کەس شایستە بێت هیدایەت و ڕێنموویی دەکات بۆ ئەو پلەو پایە بەرزانە، ئەوەش کە ڕێبازی خوا ون بکات کەس نیە ڕێنموویی بکات.

(٢٤) جا ئایا ئەو کەسەی بە روخسارو دەم و چاوی بەرگری لە سزای سەختی ڕۆژی قیامەت بکات، (وەک ئەوە وایە کە نەترسێت)، ئەوسا بەو ستەمکارانە دەوترێت: دەی بچێژن سزای ئەوەی کە دەتانکرد.

(٢٥) ئەوانەی پێش ئەمانیش بروایان بە پێغەمبەران نەبوو، زۆری پێ نەچوو تۆڵە و سزا یەخەی پێگرتن لە شوێنێکەوە کە بەتەمای نەبوون و هەستیان پێنەدەکرد.

(٢٦) ئەوسا ئیتر خوا هەر لە ژیانی دنیادا تاڵاوی کرد بە گەروویاندا و ریسوای کردن، بێگومان سزای قیامەت سەختترە بۆیان ئەگەر بیانزانیایە.

(٢٧) سوێند بێت بەخوا بەڕاستی ئێمە لەم قورئانەدا هەموو جۆرە نموونەیەکمان بۆ خەڵکی هێناوەتەوە، بۆ ئەوەی یاداوەری وەربگرن و بیرێک بکەنەوە لە ڕاستیەکان و تێبگەن.

(٢٨) قورئانێکی پاراو، بەزمانی عەرەبی، هیچ کەچی ولاریەکی تێدا بەدی ناکرێت، بۆ ئەوەی پارێزکارو خواناس بن.

(٢٩) خوای گەورە نموونەی هێناوەتەوە بە پیاوێک کە گیری خوارد بێت بەدەست چەند بەرپرسێکی شەڕانی و سەرکەشەوە، پیاوێکی تریش تەنها یەک بەرپرسی هەبێت، ئایا ئەو دوو جۆرە نموونەیە، وەک یەکن، سوپاس و ستایش تەنها شایستەی خوایە، نەخێر یەکسان نیـیە، بەڵام زۆربەی ئەو خەڵکە لەم ڕاستیە تێناگەن و نایزانن و لێکی نادەنەوە.

(٣٠) بەڕاستی تۆش دەمریت و ئەوانیش دەمرن وکەس نامێنێت.

(٣١) پاشان بێگومان ئێوە (واتە ئەگبەت و یاخیەکان) ڕۆژی قیامەت، لەلای پەروەردگارتان یەخەی یەک دەگرن، داواچی دەبن لەسەر یەکتر.

﴿ فَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّن كَذَبَ عَلَى ٱللَّهِ وَكَذَّبَ بِٱلصِّدْقِ إِذْ جَآءَهُۥٓ ۚ أَلَيْسَ فِى جَهَنَّمَ مَثْوًى لِّلْكَـٰفِرِينَ ﴿٣٢﴾ وَٱلَّذِى جَآءَ بِٱلصِّدْقِ وَصَدَّقَ بِهِۦٓ ۙ أُو۟لَـٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُتَّقُونَ ﴿٣٣﴾ لَهُم مَّا يَشَآءُونَ عِندَ رَبِّهِمْ ۚ ذَٰلِكَ جَزَآءُ ٱلْمُحْسِنِينَ ﴿٣٤﴾ لِيُكَفِّرَ ٱللَّهُ عَنْهُمْ أَسْوَأَ ٱلَّذِى عَمِلُوا۟ وَيَجْزِيَهُمْ أَجْرَهُم بِأَحْسَنِ ٱلَّذِى كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴿٣٥﴾ أَلَيْسَ ٱللَّهُ بِكَافٍ عَبْدَهُۥ ۖ وَيُخَوِّفُونَكَ بِٱلَّذِينَ مِن دُونِهِۦ ۚ وَمَن يُضْلِلِ ٱللَّهُ فَمَا لَهُۥ مِنْ هَادٍ ﴿٣٦﴾ وَمَن يَهْدِ ٱللَّهُ فَمَا لَهُۥ مِن مُّضِلٍّ ۗ أَلَيْسَ ٱللَّهُ بِعَزِيزٍ ذِى ٱنتِقَامٍ ﴿٣٧﴾ وَلَئِن سَأَلْتَهُم مَّنْ خَلَقَ ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ لَيَقُولُنَّ ٱللَّهُ ۚ قُلْ أَفَرَءَيْتُم مَّا تَدْعُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ إِنْ أَرَادَنِىَ ٱللَّهُ بِضُرٍّ هَلْ هُنَّ كَـٰشِفَـٰتُ ضُرِّهِۦٓ أَوْ أَرَادَنِى بِرَحْمَةٍ هَلْ هُنَّ مُمْسِكَـٰتُ رَحْمَتِهِۦ ۚ قُلْ حَسْبِىَ ٱللَّهُ ۖ عَلَيْهِ يَتَوَكَّلُ ٱلْمُتَوَكِّلُونَ ﴿٣٨﴾ قُلْ يَـٰقَوْمِ ٱعْمَلُوا۟ عَلَىٰ مَكَانَتِكُمْ إِنِّى عَـٰمِلٌ ۖ فَسَوْفَ تَعْلَمُونَ ﴿٣٩﴾ مَن يَأْتِيهِ عَذَابٌ يُخْزِيهِ وَيَحِلُّ عَلَيْهِ عَذَابٌ مُّقِيمٌ ﴿٤٠﴾

(٣٢) جا کێ لەو کەسە ستەمکارترە، کە درۆ بەدەم خواوە هەڵدەبەستێت و ئەو ڕاستیەی کە پێی ڕاگەیەنراوە، بڕوای پێی نی یە، کاتێک بۆی هاتووە، مەگەر لە دۆزەخدا شوێنی مانەوە بۆ کافران نیە؟!

(٣٣) ئەو کەسەش ڕاستی و حەقیقەتی هێناوەو باوەڕیشی پێیەتی، تەنها ئا ئەوانەن خواناس و دینداران.

(٣٤) جا ئەو بەختەوەرانە هەر چیان بوێت لە لایەن پەروەردگاریانەوە بۆیان ئامادەیە و پێشکەشیان دەکرێت، ئا ئەوەیە پاداشتی چاکەکاران و چاکەخوازان.

(٣٥) بۆ ئەوەی خوا چاو پۆشی بکات لە خراپترینی ئەو گوناهانەی کە ئەنجامیانداوە، بۆ ئەوەش پاداشتیان بداتەوە بەچاکتر لەوەی کە دەیانکرد .

(٣٦) مەگەرخوا بەس نیە کە پشتیوان بێت بۆ بەندەی خۆی (کە پێغەمبەرە ﷺ)، کەچی ئەوان تۆ دەترسێنن بە شتی تر جگە لە خوا، خۆ ئەوەی خوا گومڕای بکات و سەری لێبشێوێنێت، ئیتر کەس ناتوانێت دەستی بگرێت و ڕێنموویی بکات.

(٣٧) ئەوەش کە خوا هیدایەتی بدات و ڕێنموویی بکات و بیخاتە سەر ڕێی ڕاست، کەس ناتوانێت گومڕای بکات، مەگەر هەر خوا باڵادەست و تۆڵەسێنەر نیە (لە تاوانکارو تاوانباران)؟

(٣٨) ئەگەر لە بێباوەڕان بپرسیت: کێ ئاسمانەکان و زەوی دروست کردووە؛ بێ دوودڵی و بەوپەڕی دڵنیاییەوە دەڵێن: خوا، باشە؛ پێمان بڵێن: ئەوەی هاواری لێ دەکەن لەجیاتی خوا، ئەگەر ئەو خوایە بیەوێت تووشی بەڵاو ناخۆشیەکم بکات، ئایا ئەو بتانە دەتوانن فریام بکەون و نەهێڵن؟ یاخود ئەگەر بیەوێت ڕەحمەت و بەخششێکم پێ ببەخشێت، ئایا ئەوانە دەتوانن ئەو ڕەحمەت و بەخششە قەدەغە بکەن و نەیەڵن و بیگرنەوە؟! تۆ ئەی پێغەمبەر ﷺ بڵێ: من خوام بەسە کە لە تەنگانەدا دەگاتە فریام، دەبا ئەوانەی پشتیوانیان دەوێت هەر پشت بەو ببەستن.

(٣٩) هەروەها پێیان بڵێ: ئەی قەوم و هۆزەکەم ئێوە لەسەر شێوازی خۆتان کاربکەن منیش بەڕاستی سەرگەرمی کاری خۆمم، جا لە ئایندەدا بۆتان ڕوون دەبێتەوە...

(٤٠) کەکێ تووشی سزایەک دەبێت کە سەرشۆڕو شەرمەزارو سەرگەردانی دەکات لە دنیادا، لە قیامەتیشدا سزایەکی بەردەوام داوێنگیری دەبێت و لەکۆڵی نابێتەوە.

إِنَّآ أَنزَلْنَا عَلَيْكَ ٱلْكِتَـٰبَ لِلنَّاسِ بِٱلْحَقِّ ۖ فَمَنِ ٱهْتَدَىٰ فَلِنَفْسِهِۦ ۖ وَمَن ضَلَّ فَإِنَّمَا يَضِلُّ عَلَيْهَا ۖ وَمَآ أَنتَ عَلَيْهِم بِوَكِيلٍ ﴿٤١﴾ ٱللَّهُ يَتَوَفَّى ٱلْأَنفُسَ حِينَ مَوْتِهَا وَٱلَّتِى لَمْ تَمُتْ فِى مَنَامِهَا ۖ فَيُمْسِكُ ٱلَّتِى قَضَىٰ عَلَيْهَا ٱلْمَوْتَ وَيُرْسِلُ ٱلْأُخْرَىٰٓ إِلَىٰٓ أَجَلٍ مُّسَمًّى ۚ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَـَٔايَـٰتٍ لِّقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ ﴿٤٢﴾ أَمِ ٱتَّخَذُوا۟ مِن دُونِ ٱللَّهِ شُفَعَآءَ ۚ قُلْ أَوَلَوْ كَانُوا۟ لَا يَمْلِكُونَ شَيْـًٔا وَلَا يَعْقِلُونَ ﴿٤٣﴾ قُل لِّلَّهِ ٱلشَّفَـٰعَةُ جَمِيعًا ۖ لَّهُۥ مُلْكُ ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۖ ثُمَّ إِلَيْهِ تُرْجَعُونَ ﴿٤٤﴾ وَإِذَا ذُكِرَ ٱللَّهُ وَحْدَهُ ٱشْمَأَزَّتْ قُلُوبُ ٱلَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ بِٱلْـَٔاخِرَةِ ۖ وَإِذَا ذُكِرَ ٱلَّذِينَ مِن دُونِهِۦٓ إِذَا هُمْ يَسْتَبْشِرُونَ ﴿٤٥﴾ قُلِ ٱللَّهُمَّ فَاطِرَ ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ عَـٰلِمَ ٱلْغَيْبِ وَٱلشَّهَـٰدَةِ أَنتَ تَحْكُمُ بَيْنَ عِبَادِكَ فِى مَا كَانُوا۟ فِيهِ يَخْتَلِفُونَ ﴿٤٦﴾ وَلَوْ أَنَّ لِلَّذِينَ ظَلَمُوا۟ مَا فِى ٱلْأَرْضِ جَمِيعًا وَمِثْلَهُۥ مَعَهُۥ لَٱفْتَدَوْا۟ بِهِۦ مِن سُوٓءِ ٱلْعَذَابِ يَوْمَ ٱلْقِيَـٰمَةِ ۚ وَبَدَا لَهُم مِّنَ ٱللَّهِ مَا لَمْ يَكُونُوا۟ يَحْتَسِبُونَ ﴿٤٧﴾

(٤١) بێگومـان ئێمـە ئـەم قورئانـەمان بـۆ تـۆ دابـەزاندووە تـا هـەرچی راستیەکانە بۆ خـەڵکی روون بکاتـەوە، جا ئەوەی رێبازی هیدایەت بگرێتە بـەر، ئـەوە خـۆی قـازانجی کـردووە، ئـەوەش کـە گومڕابووە، گومڕابوونەکەی لەسەرخۆی دەکەوێت، وەنەبێت تۆ چاودێرو پاڵپێوەنەریان بیت (تا بـەزۆر بیانخەیتە سەر رێبازی هیدایەت).

(٤٢) هەر خوایە کە گیانەکان دەکێشێت لـەکاتی مردنیاندا، هەروەها ئـەو گیانـەش کـە نـەمرد لـە خەوەکـەیدا هـەر خـوا بـۆی دەنێرێتـەوە، جا ئـەو کەسەی کە خوا بڕیـاری مردنـی دابێـت رۆحەکـەی دەگرێتەوە و ناگەڕێتەوە بۆ لاشەی، ئـەو کەسـەش کـە رۆژی تـەواو نـەبووبێت دەینێرێتـەوە بـۆی تـا کاتێکی دیـاریکراو، بەڕاستـی لـە لـەو دیاردانـەدا چەندەها بەڵگە و نیشانەی زۆر هەیە بۆ کەسانێک کە تێفکرن و بیر بکەنـەوە (لـەم ساڵانەی دوایـدا ئارسـەر ئەلیسـۆن زانـای فیزیـای نـاوکیی لـە کۆنگرەیەکدا لە قاهیرە بابەتێکی دەربارەی مردن و خـەو پێشـکەش کـرد تیـایدا وتبـووی: دوای نزیکەی ٢٥ سـاڵ لێکۆڵینـەوە و وردبوونـەوە بـۆم دەرکەوتووە کە خـەو جۆرە مردنێکـە، ئـەو کاتـە زانایەکیموسڵمان ئاماژەی بۆئەم ئایەتەکرد، ئیتر ئارسـەر سـەری سوڕماو سـەرەنجام شـایەتمانی هێنا، ئێستا موسڵمانێکی ئینگلیزی تێکۆشەرە).

(٤٣) نەخێر، ئەوانە بیر ناکەنەوە، بەڵکو سەر لێشێواوەکان لە جیاتی خوا شتی تریان کردووە بە تکاکاری خۆیان؟! پێیان بڵێ: باشە، ئەگەر هیچیشیان بەدەست نەبێت و هەست و شعوریشیان نەبێت، (هەر دەیانکەنە تکاکار و بەتەمان شتێکتان بۆ بکەن؟).

(٤٤) ئینجا پێیان بڵێ: تکاکارو تکاوەرگرتن و تکاکردن، هەر هەمووی بەدەست خوایە، هەرچی لە ئاسمانـەکان و زەویدایە، هەر ئەو خاوەنیانە، لەوەودوایش هەر بۆلای ئەو دەبرێنەوە.

(٤٥) کاتێکیش تەنها ناوی خوا برا، ئەوانەی کە باوەڕیان بەقیامەت و رۆژی دوایی نیە دڵیان دەگیرێت و بێزاری دایان دەگرێت، (بەڵام) کاتێکیش باسی شتی تر بکرێت جگە لە خوا، دەستبەجێ دڵخۆش و کەیف خۆش دەبن و حەزی پێدەکەن.

(٤٦) ئەی پێغەمبەر ﷺ بڵێ: ئەی ئەو خوایەی کە بەدیهێنەری ئاسمانەکان و زەویت، زانای پەنهان و ئاشکرایت، هەر تۆ دادوەری دەکەیت لە نێوان بەندەکانتدا، لەو شتانەدا کە کێشەیان تیادەکرد.

(٤٧) خۆ ئەگەر بەراستی ئەوانەی کە ستەمیان کردووە، خاوەنی هەر هەموو زەوی بن، ئەوەندەی تریشی لەگەڵ بێت، ئەوە لە رۆژی قیامەتدا هەر هەمووی دەکەنە قوربـانی خۆیـان و هـەمووی دەبەخشن لـە پێنـاوی رزگـاریی خۆیاندا کاتێک کە دەبینن سزاو ئازاری دۆزەخ زۆرسەختە و لەلایەن خواوە سزاو ئـازار و ئەشکەنجەی وایـان بـۆ دەردەکەوێت کە هەرگیز بە تەمای نەبوون.

وَبَدَا لَهُمْ سَيِّئَاتُ مَا كَسَبُوا وَحَاقَ بِهِم مَّا كَانُوا بِهِۦ يَسْتَهْزِءُونَ ﴿٤٨﴾ فَإِذَا مَسَّ الْإِنسَانَ ضُرٌّ دَعَانَا ثُمَّ إِذَا خَوَّلْنَاهُ نِعْمَةً مِّنَّا قَالَ إِنَّمَا أُوتِيتُهُۥ عَلَىٰ عِلْمٍ ۚ بَلْ هِيَ فِتْنَةٌ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَهُمْ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٤٩﴾ قَدْ قَالَهَا الَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ فَمَا أَغْنَىٰ عَنْهُم مَّا كَانُوا يَكْسِبُونَ ﴿٥٠﴾ فَأَصَابَهُمْ سَيِّئَاتُ مَا كَسَبُوا ۚ وَالَّذِينَ ظَلَمُوا مِنْ هَٰؤُلَاءِ سَيُصِيبُهُمْ سَيِّئَاتُ مَا كَسَبُوا وَمَا هُم بِمُعْجِزِينَ ﴿٥١﴾ أَوَلَمْ يَعْلَمُوا أَنَّ اللَّهَ يَبْسُطُ الرِّزْقَ لِمَن يَشَاءُ وَيَقْدِرُ ۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَاتٍ لِّقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ ﴿٥٢﴾ ۞ قُلْ يَا عِبَادِيَ الَّذِينَ أَسْرَفُوا عَلَىٰ أَنفُسِهِمْ لَا تَقْنَطُوا مِن رَّحْمَةِ اللَّهِ ۚ إِنَّ اللَّهَ يَغْفِرُ الذُّنُوبَ جَمِيعًا ۚ إِنَّهُۥ هُوَ الْغَفُورُ الرَّحِيمُ ﴿٥٣﴾ وَأَنِيبُوا إِلَىٰ رَبِّكُمْ وَأَسْلِمُوا لَهُۥ مِن قَبْلِ أَن يَأْتِيَكُمُ الْعَذَابُ ثُمَّ لَا تُنصَرُونَ ﴿٥٤﴾ وَاتَّبِعُوا أَحْسَنَ مَا أُنزِلَ إِلَيْكُم مِّن رَّبِّكُم مِّن قَبْلِ أَن يَأْتِيَكُمُ الْعَذَابُ بَغْتَةً وَأَنتُمْ لَا تَشْعُرُونَ ﴿٥٥﴾ أَن تَقُولَ نَفْسٌ يَا حَسْرَتَىٰ عَلَىٰ مَا فَرَّطتُ فِي جَنبِ اللَّهِ وَإِن كُنتُ لَمِنَ السَّاخِرِينَ ﴿٥٦﴾



(٤٨) ئەوسا ئیتر سەرەنجامی کاروکردەوە ناشرینەکانی خۆیانیان بۆ دەرکەوت و ئەوەی بە گاڵتە گرتبوویان و بڕوایان پێی نەبوو داوێنگیریان دەبێت.

(٤٩) جا کاتێک ناخۆشی و ئازارێک تووشی ئینسان بێت، هاناو هاوار بۆ ئێمە دەهێنێت و ئەگەر نازو نیعمەتێکمان پێبەخشی؛ دەڵێت: ئەمە تەنها شارەزایی خۆمە، زیرەکی خۆمە، لێهاتوویی خۆمە، نەخێر وا نیە؛ ئەو بەخشینە بۆ تاقی کردنەوەیە، بەڵام زۆربەیان بەم ڕاستیە نازانن.

(٥٠) بەڕاستی ئەوانەی پێش ئەمانیش شتی وایان دەوت، وەنەبێت ئەو کاروکردەوەی کە دەیانکرد فریایان کەوتبێت و سوودی پێگەیاندبن.

(٥١) ئەوسا تۆڵەی ئەو کاروکردەوە ناشرین و نادروستانەی کە کردبوویان داوێنگیریان بوو، ئەوانەش کە ستەمیان کردووە (لە هاوەڵگەرانی مەککەو ئەوانەی دەبنە کۆسپ لەبەردەم ئاینی خوادا)، ئەوانیش تۆڵەی کردەوە ناشرینەکانیان داوێنگیریان دەبێت لەئاییندەدا، وەنەبێت ئەوانە لە تۆڵەی خوایی دەربازبن.

(٥٢) ئایا نەیانزانی کە بەڕاستی هەر خوا رزق و ڕۆزی دەبەخشێت بە هەرکەس کە بیەوێت، یان تەنگی دەکاتەوە؟ بێگومان لەو (کەم و زۆری رزق و ڕۆزیەدا) بەڵگە و نیشانەی زۆر هەیە بۆ کەسانێک کە ئیمان دەهێنن و باوەڕیان هەیە.

(٥٣) ئەی پێغەمبەر ﷺ پێیان بڵێ: خوا دەفەرموێت: ئەی بەندەکانم.. ئەوانەی کە خۆتان گوناهبار کردووە و هەڵەتان زۆرە، نائومێد مەبن لە ڕەحمەتی خوا، چونکە بەڕاستی ئەگەر ئێوە تەوبەی ڕاست و دروست بکەن، خوا لەهەر هەموو گوناهو هەڵەکانتان خۆش دەبێت، چونکە بێگومان ئەو خوایە زۆر لێخۆشبوو لێبوردەیە و زۆر بەسۆزو میهرەبانیشە.

(٥٤) هەوڵ بدەن هەمیشە و بەردەوام دڵتان لای خوابێت و بگەڕێنەوە بۆ لای پەروەردگارتان و تەسلیمی ئەوبن، پێش ئەوەی کە سزای خوا یەختان بگرێت لەوەودواش سەرکەوتوو نابن و کەس نابێت بەرگریتان لێ بکات.

(٥٥) کۆشش بکەن؛ بەردەوام شوێنی چاکترینی ئەو فەرمانانە بکەون کە لەلایەن خواوە ڕەوانەکراوە بۆتان (بێگومان لە هەموو شتێکدا چاک و چاکتر هەیە، نوێژە فەرزەکان ئەنجام بدرێت چاکە، بەڵام ئەگەر سوننەتەکان و شەونوێژیش بکرێت چاکترە، زەکات بدرێت چاکە، بەڵام بەخشینی زۆرترو زیاتریش لە زەکات، چاکترە، تۆڵەسەندن لە کەسێک کە حەقت بەسەریەوە هەیە ڕێی پێدراوە، بەڵام چاوپۆشی و لێبووردن چاکترە...هتد) پێش ئەوەی سزاو ئازاری کتوپڕ یەختان پێبگرێت ولەکاتێکدا ئێوە هەست بە نزیکی سزاکە نەکەن.

(٥٦) نەوەکو یەکێک بڵێت: ئاخ و داخ و پەشیمانی بۆ ئەو هەموو لادان و نادروستیانەی کە کردم، لە فەرمان و بەرنامەی خوادا، بێگومان لەو کەسانەش بووم کە گاڵتەیان بەدین و بەرنامەی خوا دەکرد و (ئیماندارانم بە دواکەوتوو کۆنەپەرست دەزانی).

أَوْ تَقُولَ لَوْ أَنَّ ٱللَّهَ هَدَىٰنِى لَكُنتُ مِنَ ٱلْمُتَّقِينَ ﴿٥٧﴾ أَوْ تَقُولَ حِينَ تَرَى ٱلْعَذَابَ لَوْ أَنَّ لِى كَرَّةً فَأَكُونَ مِنَ ٱلْمُحْسِنِينَ ﴿٥٨﴾ بَلَىٰ قَدْ جَآءَتْكَ ءَايَٰتِى فَكَذَّبْتَ بِهَا وَٱسْتَكْبَرْتَ وَكُنتَ مِنَ ٱلْكَٰفِرِينَ ﴿٥٩﴾ وَيَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ تَرَى ٱلَّذِينَ كَذَبُوا۟ عَلَى ٱللَّهِ وُجُوهُهُم مُّسْوَدَّةٌ ۚ أَلَيْسَ فِى جَهَنَّمَ مَثْوًى لِّلْمُتَكَبِّرِينَ ﴿٦٠﴾ وَيُنَجِّى ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ٱتَّقَوْا۟ بِمَفَازَتِهِمْ لَا يَمَسُّهُمُ ٱلسُّوٓءُ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ ﴿٦١﴾ ٱللَّهُ خَٰلِقُ كُلِّ شَىْءٍ ۖ وَهُوَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ وَكِيلٌ ﴿٦٢﴾ لَّهُۥ مَقَالِيدُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۗ وَٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ أُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْخَٰسِرُونَ ﴿٦٣﴾ قُلْ أَفَغَيْرَ ٱللَّهِ تَأْمُرُوٓنِّىٓ أَعْبُدُ أَيُّهَا ٱلْجَٰهِلُونَ ﴿٦٤﴾ وَلَقَدْ أُوحِىَ إِلَيْكَ وَإِلَى ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِكَ لَئِنْ أَشْرَكْتَ لَيَحْبَطَنَّ عَمَلُكَ وَلَتَكُونَنَّ مِنَ ٱلْخَٰسِرِينَ ﴿٦٥﴾ بَلِ ٱللَّهَ فَٱعْبُدْ وَكُن مِّنَ ٱلشَّٰكِرِينَ ﴿٦٦﴾ وَمَا قَدَرُوا۟ ٱللَّهَ حَقَّ قَدْرِهِۦ وَٱلْأَرْضُ جَمِيعًا قَبْضَتُهُۥ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ وَٱلسَّمَٰوَٰتُ مَطْوِيَّٰتٌۢ بِيَمِينِهِۦ ۚ سُبْحَٰنَهُۥ وَتَعَٰلَىٰ عَمَّا يُشْرِكُونَ ﴿٦٧﴾

(٥٧) یاخود بڵێت: ئەگەر بەڕاستی خوا هیدایەت و ڕێنموویی بکردمایە، ئەوە من لە ڕیزی پارێزکاران و چاکاندا دەبووم!!

(٥٨) یاخود کاتێک کە سزاو ئازار دەبینێت بڵێت: خۆ ئەگەر بێگومان مۆڵەتێک ببێت و جارێکی تر بگەڕێمەوە بۆ دنیا، ئەوە مەرج بێت لە چاکەکاران بم.

(٥٩) نەخێر وانی‌یە، مۆڵەت بەسەرچوو، چونکە بەڕاستی کاتی خۆی ئایەت و فەرمانی منت بۆ هات، کەچی تۆ ئەو کاتە بڕوات پێ نەدەکرد و بەدرۆت دەزانی، فیزو دەمارگیریت دەکردو، لوتت هەڵدەبڕی لەئاستیدا، تۆ هەر لە ڕیزی بێ بڕواکاندا بوویت (ئیتر ئێستا بۆچی بێ شەرمانە داوای گەڕانەوە بۆ دنیا دەکەیت؟!).

(٦٠) جا ڕۆژی قیامەت دەبینیت، ئەوانەی درۆیان بەناوی خواوە دەکرد (شتی نارەوایان تێکەڵی دین دەکرد) ڕووخساریان ڕەش و تاریکە، مەگەر شوێن و جێگە بۆ ئەو خۆ بە زل زان و لووت بەرزانە لە ئاگری دۆزەخدا نی‌یە؟!

(٦١) لەولاشەوە خوای گەورە ئەوانە ڕزگار دەکات کە دینداری و پارێزکارییان دەکرد؛ بەهۆی سەرکەوتن و دەرچوونیان لە تاقیگەی دنیادا، ئیتر هیچ جۆرە ناخۆشیەکیان تووش نایەت و دڵگرانیش نابن.

(٦٢) خوا بەدیهێنەری هەموو شتێکە، هەر ئەویش سەرپەرشتیار و پارێزەری هەموو شتێکە.

(٦٣) کلیل و جڵەوی ئاسمانەکان و زەویش هەر بەدەست ئەوە، ئەوانەش کە بێباوەڕ بوون بە ئایەت و فەرمانەکانی خوا، ئا ئەوانە خۆیان ڕەنجەڕۆ و زەرەرمەندن.

(٦٤) ئەی پێغەمبەر ﷺ بڵێ: ئەی نەفامان، دەتانەوێت و فەرمانم پێدەکەن کەجگە لە خوا شتی تر بپەرستم؟!

(٦٥) سوێند بەخوا با دڵنیابن کە وەحی و نیگا نێردراوە بۆ تۆو بۆ ئەوانەی پێش تۆش: ئەگەر هاوەڵگەر بیت و شەریک بۆ خوا بڕیار بدەیت کاروکردەوە چاکەکانیشت پووچە و دەچیتە ڕیزی خەسارەتمەند و زەرەرمەندانەوە.

(٦٦) نەخێر بەگوێیان مەکە، کەواتە هەر تەنها خوا بپەرستە و لە دەستەی سوپاسگوزاران بە.

(٦٧) خوانەناسان؛ قەدری خوایان وەک پێویست نەگرت، ڕێزیان بۆ دانەنا، بەمەرجێک هەر هەموو گۆی زەوی پڕ مشتێکی قودرەتی ئەو زاتەیە لە ڕۆژی قیامەتدا، ئاسمانەکانیش بەدەستی قودرەتی ڕاست و دروستی خوا پێچراوەن (ئاماژەیە بۆ دەسەڵاتی بێ سنووری ئەو زاتە)، پاکی و بێگەردی و بڵندی بۆ ئەو پەروەردگارە مەزنەی شایستەی ئەوە نی‌یە نەفامان هاوەڵی بۆ بڕیار بدەن و قەدری نەزانن.

وَنُفِخَ فِي ٱلصُّورِ فَصَعِقَ مَن فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَن فِي ٱلْأَرْضِ إِلَّا مَن شَآءَ ٱللَّهُ ثُمَّ نُفِخَ فِيهِ أُخْرَىٰ فَإِذَا هُمْ قِيَامٌ يَنظُرُونَ ﴿٦٨﴾ وَأَشْرَقَتِ ٱلْأَرْضُ بِنُورِ رَبِّهَا وَوُضِعَ ٱلْكِتَٰبُ وَجِاْىٓءَ بِٱلنَّبِيِّـۧنَ وَٱلشُّهَدَآءِ وَقُضِيَ بَيْنَهُم بِٱلْحَقِّ وَهُمْ لَا يُظْلَمُونَ ﴿٦٩﴾ وَوُفِّيَتْ كُلُّ نَفْسٍ مَّا عَمِلَتْ وَهُوَ أَعْلَمُ بِمَا يَفْعَلُونَ ﴿٧٠﴾ وَسِيقَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓا۟ إِلَىٰ جَهَنَّمَ زُمَرًا حَتَّىٰٓ إِذَا جَآءُوهَا فُتِحَتْ أَبْوَٰبُهَا وَقَالَ لَهُمْ خَزَنَتُهَآ أَلَمْ يَأْتِكُمْ رُسُلٌ مِّنكُمْ يَتْلُونَ عَلَيْكُمْ ءَايَٰتِ رَبِّكُمْ وَيُنذِرُونَكُمْ لِقَآءَ يَوْمِكُمْ هَٰذَا قَالُوا۟ بَلَىٰ وَلَٰكِنْ حَقَّتْ كَلِمَةُ ٱلْعَذَابِ عَلَى ٱلْكَٰفِرِينَ ﴿٧١﴾ قِيلَ ٱدْخُلُوٓا۟ أَبْوَٰبَ جَهَنَّمَ خَٰلِدِينَ فِيهَا فَبِئْسَ مَثْوَى ٱلْمُتَكَبِّرِينَ ﴿٧٢﴾ وَسِيقَ ٱلَّذِينَ ٱتَّقَوْا۟ رَبَّهُمْ إِلَى ٱلْجَنَّةِ زُمَرًا حَتَّىٰٓ إِذَا جَآءُوهَا وَفُتِحَتْ أَبْوَٰبُهَا وَقَالَ لَهُمْ خَزَنَتُهَا سَلَٰمٌ عَلَيْكُمْ طِبْتُمْ فَٱدْخُلُوهَا خَٰلِدِينَ ﴿٧٣﴾ وَقَالُوا۟ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ ٱلَّذِي صَدَقَنَا وَعْدَهُۥ وَأَوْرَثَنَا ٱلْأَرْضَ نَتَبَوَّأُ مِنَ ٱلْجَنَّةِ حَيْثُ نَشَآءُ فَنِعْمَ أَجْرُ ٱلْعَٰمِلِينَ ﴿٧٤﴾

(٦٨) لەو ڕۆژەدا فوو دەكرێت بە ـ صور ـ دا، (مەگەر هەر خوا خۆی بزانێت چ دەزگایەكە) هەر كەس لە ئاسمانەكان و زەویدا مابێت خێرا دەمرێت، مەگەر كەسێك خوا ویستی لەسەر مردنی نەبێت، لەوەودوا فوویەكی تری پیادا دەكرێتەوە، جا دەسبەجێ هەرهەموو خەڵكی هەستاونەتە سەرپێ و بەسەرسامیەوە چاوەڕوانن.

(٦٩) (دیارە كە خۆری دنیا نەماوە، زەوی بۆتە گۆڕەپانێكی فراوان) ئەوسا بەنوورێك كە خوا فەراهەمی دەهێنێت زەوی روناك دەبێتەوە، كارنامە و دۆسیەكانیش دانراون، سەرەتا پێغەمبەران و شەهیدان دەهێنرێن و دادوەری لە نێوانیاندا ئەنجام دەدرێت بەشێوەیەكی حەق و ڕاستی، بێگومان ئەوان هیچ جۆرە ستەمێكیان لێ ناكرێت.

(٧٠) هەر كەسە ئەنجامی كردەوەی خۆی وەردەگرێت بەتەواوی، سەرئەنجامی كۆششی خۆی دەست دەكەوێت، چونكە ئەو زاتە زانایە بەو كارو كردەوانەی كە خەڵكی دەیكەن.

(٧١) ئەوسا ئەوانەی كە بێ باوەڕ بوون، ڕاپێچ دەكرێن بەرەو دۆزەخ دەستە دەستە و تاقم تاقم دەگوێزرێنەوە، تا كاتێك دەگەنە بەر قاپیەكانی، (هەموو مۆڵدەخۆن لەبەردەمیدا، دوای ماوەیەك) بۆیان دەكرێتەوە، فریشتەی بەرپرس و سەرپەرشتیار سەرزەنشتیان دەكات و پێیان دەڵێت: باشە، مەگەر پێغەمبەران لەخۆتان ڕەوانە نەكرابوو بۆتان كە ئایەتەكانی پەروەردگاری خۆتان بەسەردا بخوێنێتەوە، وە یاداوەریتان بكات و داتان بچڵەكێنێت لە گەیشتنی ئەم ڕۆژە؟! بەدەم ئاخوداخ و ناڵەوە دەڵێن: بەڵێ، بەڵام تازە، بەڵێ، سوودی نیە و بڕیاری سزاو ئازار دراوە بەسەر كافر و بێبڕواكاندا.

(٧٢) ئەوسا ئیتر پێیان دەوترێت: دەی ئیتر لە قاپیەكانی دۆزەخەوە بۆ ژوورەوە، بچنە ناوی ژیانی ناخۆش و سەختیش بۆتان بەردەوامە، مردنیش نیە نای كە چەند ناسازە، جێگە و ڕێگەی لووت بەرز و خۆ بەزل زانەكان.

(٧٣) لەولاشەوە ئەوانەی كە پارێزكار و بەندەی ملكەچی پەروەردگاریان بوون، ئەوانەی حسابیان بۆ ئەو ڕۆژە دەكرد دەستەدەستە و پۆل پۆل بەوپەڕی ڕێزەوە بەڕێ دەكرێن بەرەو بەهەشت، هەتا كاتێ كە دەگەنە ئەوێ دەروازەكانی لە ڕوویاندا كراوەیە و لەسەر پشتە، فریشتەكانی بەرپرس و سەرپەرشتیارانی بەهەشت زۆر بەگەرمی و ڕووخۆشیەوە پێشوازییان لێ دەكەن و دەڵێن: درود و سڵاوتان لێبێت، ئێوە پاك و خاوێنن، كەواتە فەرموون بچنە ناو بەهەشتەوە، هاوڕێ لەگەڵ ژیانی هەمیشەیی و نەبڕاوەدا.

(٧٤) ئەوسا ئیتر ئەو بەختەوەرانە دەڵێن: سوپاس و ستایش بۆ ئەو خوایەی، كە بەڵێنی خۆی بۆمان بردە سەر و كردینی بەخاوەنی سەرزەمینی بەهەشت و لە هەر شوێنێك و لە هەر جێیەكیدا بمانەوێت سەربەستانە ژیان دەبەینە سەر، ئای چەندە پاداشتی تێكۆشەران و خەباتكاران چاك و پاك و بەنرخە.

وَتَرَى ٱلْمَلَٰٓئِكَةَ حَآفِّينَ مِنْ حَوْلِ ٱلْعَرْشِ يُسَبِّحُونَ بِحَمْدِ رَبِّهِمْ ۖ وَقُضِىَ بَيْنَهُم بِٱلْحَقِّ وَقِيلَ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٧٥﴾

سُورَةُ غَافِرٍ

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

حمٓ ﴿١﴾ تَنزِيلُ ٱلْكِتَٰبِ مِنَ ٱللَّهِ ٱلْعَزِيزِ ٱلْعَلِيمِ ﴿٢﴾ غَافِرِ ٱلذَّنۢبِ وَقَابِلِ ٱلتَّوْبِ شَدِيدِ ٱلْعِقَابِ ذِى ٱلطَّوْلِ ۖ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ۖ إِلَيْهِ ٱلْمَصِيرُ ﴿٣﴾ مَا يُجَٰدِلُ فِىٓ ءَايَٰتِ ٱللَّهِ إِلَّا ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ فَلَا يَغْرُرْكَ تَقَلُّبُهُمْ فِى ٱلْبِلَٰدِ ﴿٤﴾ كَذَّبَتْ قَبْلَهُمْ قَوْمُ نُوحٍ وَٱلْأَحْزَابُ مِنۢ بَعْدِهِمْ ۖ وَهَمَّتْ كُلُّ أُمَّةٍۭ بِرَسُولِهِمْ لِيَأْخُذُوهُ ۖ وَجَٰدَلُوا۟ بِٱلْبَٰطِلِ لِيُدْحِضُوا۟ بِهِ ٱلْحَقَّ فَأَخَذْتُهُمْ ۖ فَكَيْفَ كَانَ عِقَابِ ﴿٥﴾ وَكَذَٰلِكَ حَقَّتْ كَلِمَتُ رَبِّكَ عَلَى ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓا۟ أَنَّهُمْ أَصْحَٰبُ ٱلنَّارِ ﴿٦﴾ ٱلَّذِينَ يَحْمِلُونَ ٱلْعَرْشَ وَمَنْ حَوْلَهُۥ يُسَبِّحُونَ بِحَمْدِ رَبِّهِمْ وَيُؤْمِنُونَ بِهِۦ وَيَسْتَغْفِرُونَ لِلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ رَبَّنَا وَسِعْتَ كُلَّ شَىْءٍ رَّحْمَةً وَعِلْمًا فَٱغْفِرْ لِلَّذِينَ تَابُوا۟ وَٱتَّبَعُوا۟ سَبِيلَكَ وَقِهِمْ عَذَابَ ٱلْجَحِيمِ ﴿٧﴾



(٧٥) ئەوسا ئیتر فریشتەکان دەبینیت دەوری تەختی ـ شاهی شاهانیان ـ داوە و سەرگەرمی تەسبیحات و سوپاس و ستایشی پەروەردگاریانن و حەق و دادوەری لە نێوان هەمواندا جێبەجێ کرا، ئینجا بە یەکدەنگ لە هەموو لایەکەوە دەوترێت : الحمد لله رب العالمین.

سورەتی (غافر)

بەناوی خوای بەخشندە و میهرەبان

(١) سەرنجی سەرەتای سووەتی (البقرة) بدە..

(٢) هاتنە خوارەوەی ئەم قورئانە لەلایەن خوای بالادەست و شارەزا و زاناوەیە.

(٣) هەمیشە ئەو زاتە لێخۆش بووی گوناهە، وەرگری تەوبە و پەشیمانیە لە بەندە گوناهبارەکانی تۆڵەسێنەرە زۆر بەسەختی لە یاخی بووان و ستەمکاران، دەسەڵاتدارە و خاوەن و بەخشێنەری ناز و نیعمەتەکانە، هیچ خوایەک نیە جگە لەو، سەرەنجامیش هەر بۆ لای ئەوە.

(٤) هیچ کەس لە بەرامبەری ئایەت و فەرمانەکانی خواوە موجادەلە و دەمەدەمێ ناکات، جگە لەوانەی کە بێبڕواو خوانەناس بوون، ئەی پێغەمبەرﷺ کەواتە دەسەلات و سەرمایە و هێزیان فریوت نەدات.

(٥) پێش ئەمانیش (کافرانی مەککە و ئەوانەی لە دوایان دێن) قەومی نوح و گەلیّ دەستە و گرۆی تریش باوەڕیان بە پێغەمبەرەکانیان نەکرد، هەر گەلێک پەلاماری پێغەمبەرەکەی دەدا تا دەسگیری بکات و ئازاری بدات و لە بەرنامەکەی لای بدات، هەروەها موجادەلە و دەمەدەمێیان دەکرد بۆ ئەوەی حەق داپۆشن و نەیهێڵن، جا منیش پێچامنەوە و لەناوم بردن، بڕوانن چۆن تۆڵەیەکم لێسەندن!

(٦) ئا بەو شێوەیە بڕیاری پەروەردگاری تۆ ئەی محمدﷺ چەسپا بەسەر ئەوانەدا کە خوانەناس و بێباوەڕ بوون، بەڕاستی ئەوانە نیشتەجێی دۆزەخن.

(٧) ئەو فریشتانەی کە عەرش و تەختی پەروەردگار هەڵدەگرن، ئەوانەش کە بەدەوریدا دەسوڕێنەوە، تەسبیحات و ستایش و سوپاسی پەروەردگاریان دەکەن، ئیمان و باوەڕی زۆر بەهێزو دامەزراویان پێیەتی، داوای لێخۆشبوونیش دەکەن بۆ ئەوانەی کە باوەڕیان هێناوە، دەڵێن: پەروەردگارا! ڕەحمەت و میهرەبانی تۆ، زانست و زانیاری تۆ، هەموو شتێکت پێ گرتۆتەوە، کەوابوو خۆش ببە لەوانەی کە تەوبەیان کردووە و لە گوناهەکانیان پەشیمانن و شوێن بەرنامە و ڕێبازی تۆ دەکەون، هەروەها لە ئاگری دۆزەخیش بیانپارێزە.

رَبَّنَا وَأَدۡخِلۡهُمۡ جَنَّٰتِ عَدۡنٍ ٱلَّتِي وَعَدتَّهُمۡ وَمَن صَلَحَ مِنۡ ءَابَآئِهِمۡ وَأَزۡوَٰجِهِمۡ وَذُرِّيَّٰتِهِمۡۚ إِنَّكَ أَنتَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡحَكِيمُ ﴿٨﴾ وَقِهِمُ ٱلسَّيِّـَٔاتِۚ وَمَن تَقِ ٱلسَّيِّـَٔاتِ يَوۡمَئِذٖ فَقَدۡ رَحِمۡتَهُۥۚ وَذَٰلِكَ هُوَ ٱلۡفَوۡزُ ٱلۡعَظِيمُ ﴿٩﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ يُنَادَوۡنَ لَمَقۡتُ ٱللَّهِ أَكۡبَرُ مِن مَّقۡتِكُمۡ أَنفُسَكُمۡ إِذۡ تُدۡعَوۡنَ إِلَى ٱلۡإِيمَٰنِ فَتَكۡفُرُونَ ﴿١٠﴾ قَالُواْ رَبَّنَآ أَمَتَّنَا ٱثۡنَتَيۡنِ وَأَحۡيَيۡتَنَا ٱثۡنَتَيۡنِ فَٱعۡتَرَفۡنَا بِذُنُوبِنَا فَهَلۡ إِلَىٰ خُرُوجٖ مِّن سَبِيلٖ ﴿١١﴾ ذَٰلِكُم بِأَنَّهُۥٓ إِذَا دُعِيَ ٱللَّهُ وَحۡدَهُۥ كَفَرۡتُمۡ وَإِن يُشۡرَكۡ بِهِۦ تُؤۡمِنُواْۚ فَٱلۡحُكۡمُ لِلَّهِ ٱلۡعَلِيِّ ٱلۡكَبِيرِ ﴿١٢﴾ هُوَ ٱلَّذِي يُرِيكُمۡ ءَايَٰتِهِۦ وَيُنَزِّلُ لَكُم مِّنَ ٱلسَّمَآءِ رِزۡقٗاۚ وَمَا يَتَذَكَّرُ إِلَّا مَن يُنِيبُ ﴿١٣﴾ فَٱدۡعُواْ ٱللَّهَ مُخۡلِصِينَ لَهُ ٱلدِّينَ وَلَوۡ كَرِهَ ٱلۡكَٰفِرُونَ ﴿١٤﴾ رَفِيعُ ٱلدَّرَجَٰتِ ذُو ٱلۡعَرۡشِ يُلۡقِي ٱلرُّوحَ مِنۡ أَمۡرِهِۦ عَلَىٰ مَن يَشَآءُ مِنۡ عِبَادِهِۦ لِيُنذِرَ يَوۡمَ ٱلتَّلَاقِ ﴿١٥﴾ يَوۡمَ هُم بَٰرِزُونَۖ لَا يَخۡفَىٰ عَلَى ٱللَّهِ مِنۡهُمۡ شَيۡءٞۚ لِّمَنِ ٱلۡمُلۡكُ ٱلۡيَوۡمَۖ لِلَّهِ ٱلۡوَٰحِدِ ٱلۡقَهَّارِ ﴿١٦﴾

پەروەردگارا بیانخەرە ئەو باخ و باخاتەی بەهەشتی عەدنەوە کە بەڵێنت پێداون، هاوڕێ لەگەڵ ئەو کەسانەدا کە چاک وخواناسن، لە باوک دایک و هاوسەران و نەوەکانیان، بەڕاستی هەر تۆ خوایەکی باڵادەست و دانایت.

لە تۆڵەی هەموو گوناهەکان بیانپارێزە، خۆ هەرکەسێک لە تۆڵەی گوناهەکان بپارێزیت لە رۆژی قیامەتدا، ئەوە ئیتر تۆ رەحمت پێ کردووە، هەر ئەوەشە سەرفرازی و سەرکەوتنی گەورە و بێسنوور.

بێگومان ئەوانەی کە بێباوەڕ بوون لە قیامەتدا بانگیان لێ دەکرێت کە رق و خەشم و قینی خوا زۆر زیاترە لە رق و خەشم و قینتان دژ بەیەکتر، چونکە کاتی خۆی بانگ دەکران بۆ ئیمانو باوەڕ کەچی رێبازی کوفرتان بەرنەدەدا و لەسەری بەردەوام دەبوون.

کافران لە وەڵامدا دەڵێن: پەروەردگارا تۆ دەسەڵاتت بێسنوورە دووجار ئێمەت مراندووە و دووجار ئێمەت زیندووکردۆتەوە (مەبەست نەبوونی پێش هاتنە دنیایە، کە جۆرە مردنێکە و ئەو مردنەش کە دەیزانن، ژیانی دنیاو زیندوو بوونەوەی قیامەتیش دوو جۆر ژیانە) ئایا چارەسەرێک، رێبازێک نیە، بۆ رزگاریمان؟

(١٢) ئێستاش ئەو بارودۆخەی کە تێی کەوتوون بەهۆی ئەوەوەیە، بەراستی کاتێک بانگەواز بکرێت بۆ پەرستنی خوای تاک و تەنها، ئێوە باوەڕ ناهێنن، خۆ ئەگەر هاوەڵی بۆ بڕیار بدرێت و رێبازی یەکخواناسین کەناربخرێت، ئێوە باوەڕ بەوە دەهێنن، ئێستاش فەرمان، هەر فەرمانی خوای بەرزو بڵند و گەورەیە (بۆ جیاکردنەوەی ئیمانداران لە بێباوەڕان).

(١٣) ئەو خوایە بەردەوام بەڵگە و نیشانەی دەسەڵاتداریی خۆیتان نیشان دەدات، لە ئاسمانیشەوە رزق و رۆزیتان بۆ دادەبەزێنێت (وەک: باران، هەوا، جۆرەها تیشک، کە دەبنە سەرچاوەی رۆزی) کەسیش یاداوەری وەرناگرێت و بیرناکاتەوە جگە لەوانەی کە: دەگەڕێنەوە بۆ لای ئەو زاتە .

(١٤) کەواتە ئەی ئیمانداران: ئێوە هەر هانا و هاوار بۆ خوا بەرن و ملکەچ و فەرمانبەرداری ئاین و بەرنامەکەی ئەو بن، ئەگەر چی کافرو بێبڕواکان پێی سەغڵەت بن و پێیان ناخۆش بێت.

(١٥) ئەو پەروەردگارە پلەو پایەی زۆر بڵندە، خاوەنی تەختی فەرمانڕەوایی تایبەتی خۆیەتی، ئەوزاتە وەحی و نیگا بە فەرمانی خۆی دەنێرێت بۆ هەرکام لە بەندەکانی کە بیەوێت، (قورئان رۆحە، چونکە ژیان بەخشە بەعەقڵ و دڵ و دەروون)، بۆ ئەوەی خەڵکی بترسێنێت لە رۆژی بەیەکگەیشتنەوە (گەیشتنەوەی رۆح بەجەستە، گەیشتنەوەی ئادەمیزاد بەکردەوەکانی..).

(١٦) ئەو رۆژە هەموویان بە دەرەوەن، (روت و رەجاڵ، نهێنی و ئاشکرا وەک یەکە)، هیچ شتێکیان لە خوا شاراوە نیە، ئەوسا پەروەردگاری مەزن، دەفەرموێت: ئەمڕۆ پاشایەتی و فەرمانڕەوایی شایستەی کێیە؟ کێ خاوەنی هەموو ئەم بوونەوەرەیە؟ کەس نیە وەڵام بداتەوە، خۆی دەفەرموێت: هەر هەمووی بۆ خوای تاک و تەنها و خەشمگیرە.

ٱلْيَوْمَ تُجْزَىٰ كُلُّ نَفْسٍۭ بِمَا كَسَبَتْ ۚ لَا ظُلْمَ ٱلْيَوْمَ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ سَرِيعُ ٱلْحِسَابِ ﴿١٧﴾ وَأَنذِرْهُمْ يَوْمَ ٱلْـَٔازِفَةِ إِذِ ٱلْقُلُوبُ لَدَى ٱلْحَنَاجِرِ كَـٰظِمِينَ ۚ مَا لِلظَّـٰلِمِينَ مِنْ حَمِيمٍ وَلَا شَفِيعٍ يُطَاعُ ﴿١٨﴾ يَعْلَمُ خَآئِنَةَ ٱلْأَعْيُنِ وَمَا تُخْفِى ٱلصُّدُورُ ﴿١٩﴾ وَٱللَّهُ يَقْضِى بِٱلْحَقِّ ۖ وَٱلَّذِينَ يَدْعُونَ مِن دُونِهِۦ لَا يَقْضُونَ بِشَىْءٍ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْبَصِيرُ ﴿٢٠﴾ ۞ أَوَلَمْ يَسِيرُوا۟ فِى ٱلْأَرْضِ فَيَنظُرُوا۟ كَيْفَ كَانَ عَـٰقِبَةُ ٱلَّذِينَ كَانُوا۟ مِن قَبْلِهِمْ ۚ كَانُوا۟ هُمْ أَشَدَّ مِنْهُمْ قُوَّةً وَءَاثَارًا فِى ٱلْأَرْضِ فَأَخَذَهُمُ ٱللَّهُ بِذُنُوبِهِمْ وَمَا كَانَ لَهُم مِّنَ ٱللَّهِ مِن وَاقٍ ﴿٢١﴾ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ كَانَت تَّأْتِيهِمْ رُسُلُهُم بِٱلْبَيِّنَـٰتِ فَكَفَرُوا۟ فَأَخَذَهُمُ ٱللَّهُ ۚ إِنَّهُۥ قَوِىٌّ شَدِيدُ ٱلْعِقَابِ ﴿٢٢﴾ وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا مُوسَىٰ بِـَٔايَـٰتِنَا وَسُلْطَـٰنٍ مُّبِينٍ ﴿٢٣﴾ إِلَىٰ فِرْعَوْنَ وَهَـٰمَـٰنَ وَقَـٰرُونَ فَقَالُوا۟ سَـٰحِرٌ كَذَّابٌ ﴿٢٤﴾ فَلَمَّا جَآءَهُم بِٱلْحَقِّ مِنْ عِندِنَا قَالُوا۟ ٱقْتُلُوٓا۟ أَبْنَآءَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ مَعَهُۥ وَٱسْتَحْيُوا۟ نِسَآءَهُمْ ۚ وَمَا كَيْدُ ٱلْكَـٰفِرِينَ إِلَّا فِى ضَلَـٰلٍ ﴿٢٥﴾

(١٧) ئەمڕۆ هەموو کەس پاداشتی کار و کردەوەی خۆی وەردەگرێت، ئەمڕۆ هیچ جۆرە ستەمێک لە کەس ناکرێت، بەڕاستی خوای گەورە بەخێرایی لێپرسینەوەکان ئەنجام دەدات (چونکە هەموو شت روونە لای).

(١٨) ئەی پێغەمبەر ﷺ بیانترسێنە و ئاگایان بکە لە ڕۆژە نزیکەکە، ڕۆژی قیامەت، کاتێک کە دڵەکان دەگەنە گەروو، غەمگینی و پەژارە و تەنگانە دڵ ودەروونی خوانەناسان بە تەواوی داگیر دەکات، هیچ دڵسۆز و پشتیوانێک بۆ ستەمکاران نییە، کەس تکاکار و غەمخۆریان نییە، تا قسەیەکی رەواجی هەبێت و تکای لێ وەربگیرێت.

(١٩) ئەو خوایە هەمیشە چاوە خیانەتکار و ناپاکەکان دەناسێت و دەزانێت چی لە دڵ و دەروون و سینەکاندا حەشاردراوە.

(٢٠) هەمیشە خوا دادوەریی لەسەر بنچینەی حەق و ڕاستی ئەنجام دەدات، ئەوانەی جگە لەو زاتە هاواریان لێ دەکەن، هیچ دەسەڵات و داوەرییەکیان لە دەست نایەت، بەڕاستی هەر خوا خۆی بیسەر و زانایە.

(٢١) ئایا ئەوە بەسەر زەویدا نەڕۆشتوون، تا تەماشا بکەن و سەرنج بدەن، سەرئەنجامی ئەوانەی پێش ئەمان چۆن بوو؛ چیان بەسەرهات ؟ ئەوانە لەمان زۆر بەهێزتر بوون و جێ دەست و شوێنەواریان زیاتر لە زەویدا ئاشکرابوو، جا ئەوە بوو خوا بەهۆی گوناهەکانیانەوە لە ناوی بردن، کەس نەیتوانی لە سزای خوا بیانپارێزێت و پەنایان بدات و ڕزگاریان بکات.

(٢٢) ئەو بارودۆخەیان بۆیە بەسەردا هات، چونکە بەڕاستی کاتی خۆی پێغەمبەرەکانیان بە چەندەها بەڵگە و نیشانەی ئاشکراوە ڕاستیەکانیان پێرادەگەیاندن، کەچی بڕوایان نەکرد و باوەڕیان نەهێنا، ئینجا خوای گەورە لەناوی بردن و پێچانیەوە، چونکە بێگومان ئەو خوایە بەهێزە و تۆڵەسەندنەوەی زۆر توند و بە ئێشە لە بێباوەڕان.

(٢٣) سوێند بەخوا بەڕاستی ئێمە موسامان ڕەوانە کرد هاوڕێ لەگەڵ چەندەها بەڵگە و نیشانەی ئاشکرادا...

(٢٤) بۆ سەر فیرعەون و هامان و قاروون، بەڵام ئەو ستەمکارانە وتیان: جادووگەرێکی درۆزنە!!

(٢٥) جا کاتێک هات بۆ لایان و هەموو ڕاستیەکی بۆ سەلماندن بە بەڵگە و معجزەی ئاشکراوە کە لەلایەن ئێمەوە پێی بەخشرابوو، فیرعەون و دارودەستەی فەرمانیاندا و وتیان: ڕۆڵەی نێرینەی هەموو ئەوانە بکوژن کە باوەڕیان هێناوە و لەگەڵ موسادان، ئافرەت و کچەکانیان بهێڵنەوە بۆ کارەکەری، بەڵام خەیاڵیان خاوە، لەکاتێکدا پیلان و تەڵەکەی بێ باوەڕان هیچ نییە، تەنها سەری لەسەرگەردانیەوە دەردەچێت.

وَقَالَ فِرۡعَوۡنُ ذَرُونِيٓ أَقۡتُلۡ مُوسَىٰ وَلۡيَدۡعُ رَبَّهُۥٓۖ إِنِّيٓ أَخَافُ أَن يُبَدِّلَ دِينَكُمۡ أَوۡ أَن يُظۡهِرَ فِي ٱلۡأَرۡضِ ٱلۡفَسَادَ ﴿٢٦﴾ وَقَالَ مُوسَىٰٓ إِنِّي عُذۡتُ بِرَبِّي وَرَبِّكُم مِّن كُلِّ مُتَكَبِّرٖ لَّا يُؤۡمِنُ بِيَوۡمِ ٱلۡحِسَابِ ﴿٢٧﴾ وَقَالَ رَجُلٞ مُّؤۡمِنٞ مِّنۡ ءَالِ فِرۡعَوۡنَ يَكۡتُمُ إِيمَٰنَهُۥٓ أَتَقۡتُلُونَ رَجُلًا أَن يَقُولَ رَبِّيَ ٱللَّهُ وَقَدۡ جَآءَكُم بِٱلۡبَيِّنَٰتِ مِن رَّبِّكُمۡۖ وَإِن يَكُ كَٰذِبٗا فَعَلَيۡهِ كَذِبُهُۥۖ وَإِن يَكُ صَادِقٗا يُصِبۡكُم بَعۡضُ ٱلَّذِي يَعِدُكُمۡۖ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَهۡدِي مَنۡ هُوَ مُسۡرِفٞ كَذَّابٞ ﴿٢٨﴾ يَٰقَوۡمِ لَكُمُ ٱلۡمُلۡكُ ٱلۡيَوۡمَ ظَٰهِرِينَ فِي ٱلۡأَرۡضِ فَمَن يَنصُرُنَا مِنۢ بَأۡسِ ٱللَّهِ إِن جَآءَنَاۚ قَالَ فِرۡعَوۡنُ مَآ أُرِيكُمۡ إِلَّا مَآ أَرَىٰ وَمَآ أَهۡدِيكُمۡ إِلَّا سَبِيلَ ٱلرَّشَادِ ﴿٢٩﴾ وَقَالَ ٱلَّذِيٓ ءَامَنَ يَٰقَوۡمِ إِنِّيٓ أَخَافُ عَلَيۡكُم مِّثۡلَ يَوۡمِ ٱلۡأَحۡزَابِ ﴿٣٠﴾ مِثۡلَ دَأۡبِ قَوۡمِ نُوحٖ وَعَادٖ وَثَمُودَ وَٱلَّذِينَ مِنۢ بَعۡدِهِمۡۚ وَمَا ٱللَّهُ يُرِيدُ ظُلۡمٗا لِّلۡعِبَادِ ﴿٣١﴾ وَيَٰقَوۡمِ إِنِّيٓ أَخَافُ عَلَيۡكُمۡ يَوۡمَ ٱلتَّنَادِ ﴿٣٢﴾ يَوۡمَ تُوَلُّونَ مُدۡبِرِينَ مَا لَكُم مِّنَ ٱللَّهِ مِنۡ عَاصِمٖۗ وَمَن يُضۡلِلِ ٱللَّهُ فَمَا لَهُۥ مِنۡ هَادٖ ﴿٣٣﴾

(٢٦) ئینجا فیرعەون وتی: وازم لیٚ بهێنن با موسا بکوژم، با هەر هاوار لە پەروەردگاری بکات، چونکە بەراستی من دەترسم کە دین و ئاینتان بگۆڕێت!، یاخود دووبەرەکی و خراپە و شەڕ و شۆڕ لە وڵات و سەرزەویدا بەرپا بکات!!

(٢٧) موساش وتی: بێگومان من پەنا دەگرم بە پەروەردگاری خۆم کە پەروەردگاری ئێوەشە لە هەموو لووت بەرزو خۆبەزل زانێک باوەڕی بەرۆژی لێپرسینەوە نەبێت (راستیەکان ناوەژوو بکات).

(٢٨) (دیارە سەرئەنجام فیرعەون بڕیاریداوە موسا شەهید بکات بۆیە): پیاوێکی ئیماندار لە خزمانی فیرعەون کە باوەڕەکەی شاردبۆوە تا ئەو کاتە، وتی: ئایا رەوایە پیاوێک بکوژن تەنها تاوانی ئەوەیە کە دەڵێت پەروەردگارم ـ الله ـ یە، لەکاتێکدا چەندەها بەڵگە و نیشانەشی لە لایەن پەروەردگارتانەوە بۆ هێناون و نیشانی داون، خۆ ئەگەر درۆزن بێت، ئەوە درۆزنیەکەی بە زەرەری خۆی تەواو دەبێت، خۆ ئەگەر راستگۆبێت هەندێک لەو بەڵایانەتان بەسەردێت کە پێی راگەیاندوون، بەراستی من دڵنیام کە: خوا هیدایەت و رێنموویی کەسێک ناکات زیادەڕە و درۆزن بێت (واتە: ئەگەر موسا درۆزن بوایە، ئەو هەموو پشتیوانیەی لیٚ نەدەکرا لەلایەن خواوە).

(٢٩) هەروەها وتی: ئەی قەوم و هۆزم ئەمرۆ ئێوە دەسەڵاتتان هەیە بەسەر ئەم ناوچەیەدا و بەئارەزووی خۆتان فەرمانڕەوایی تیادا دەکەن، جا بیر بکەنەوە و تێفکرن کێ دەتوانێت فریامان بکەوێت، کێ دەتوانێت رزگارمان بکات، لە تۆڵە و سزای خوا ئەگەر یەخەی پێگرتین؟ فیرعەون قسەکەی پیٚ بری ووتی: من تەنها هەر ئەو راو بۆچوونە بەچاک دەزانم و لام پەسەندەکە پێم راگەیاندن، من تەنها رێبازی چاک و دروستم نیشانداون!!

(٣٠) ئەو پیاوەی کە ئیمانی هێنابوو وتی: بێگومان من دەترسم رۆژێکتان بەسەربێت وەکو ئەو رۆژەی بەسەر گرۆ و قەومە نالەبارەکانی پێشوودا هات...

(٣١) وەکو ئەوەی کە بەسەر قەومی نوح و عاد و ثمود و ئەوانەی بەدوای ئەواندا هاتن، جا وەنەبێت خوا بیەوێت ستەم لە بەندەکان بکات و حەز بە تیاچونیان بکات.

(٣٢) ئەی قەوم و هۆزم من بەراستی دەترسم لە رۆژی هاوارو ئاهوناڵە و بانگکردنتان بۆ لێپرسینەوە (قیامەت).

(٣٣) ئەو رۆژەی کە هەموو لەبەری هەڵدێن و پشت هەڵدەکەن و هەموو سەرگەردانن، نازانن چی بکەن و روو بکەنە کوێ، کەس نیە پەناتان بدات لە خەشم و قینی خوا، ئەوەش خوا گومڕای بکات بەهۆی خراپەکاری خۆیەوە، هیچ کەسی تر ناتوانێت هیدایەت و رێنموویی بکات.

وَلَقَدْ جَآءَكُمْ يُوسُفُ مِن قَبْلُ بِٱلْبَيِّنَٰتِ فَمَا زِلْتُمْ فِى شَكٍّ مِّمَّا جَآءَكُم بِهِۦ ۖ حَتَّىٰٓ إِذَا هَلَكَ قُلْتُمْ لَن يَبْعَثَ ٱللَّهُ مِنۢ بَعْدِهِۦ رَسُولًا ۚ كَذَٰلِكَ يُضِلُّ ٱللَّهُ مَنْ هُوَ مُسْرِفٌ مُّرْتَابٌ ﴿٣٤﴾ ٱلَّذِينَ يُجَٰدِلُونَ فِىٓ ءَايَٰتِ ٱللَّهِ بِغَيْرِ سُلْطَٰنٍ أَتَىٰهُمْ ۖ كَبُرَ مَقْتًا عِندَ ٱللَّهِ وَعِندَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ۚ كَذَٰلِكَ يَطْبَعُ ٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ قَلْبِ مُتَكَبِّرٍ جَبَّارٍ ﴿٣٥﴾ وَقَالَ فِرْعَوْنُ يَٰهَٰمَٰنُ ٱبْنِ لِى صَرْحًا لَّعَلِّىٓ أَبْلُغُ ٱلْأَسْبَٰبَ ﴿٣٦﴾ أَسْبَٰبَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ فَأَطَّلِعَ إِلَىٰٓ إِلَٰهِ مُوسَىٰ وَإِنِّى لَأَظُنُّهُۥ كَٰذِبًا ۚ وَكَذَٰلِكَ زُيِّنَ لِفِرْعَوْنَ سُوٓءُ عَمَلِهِۦ وَصُدَّ عَنِ ٱلسَّبِيلِ ۚ وَمَا كَيْدُ فِرْعَوْنَ إِلَّا فِى تَبَابٍ ﴿٣٧﴾ وَقَالَ ٱلَّذِىٓ ءَامَنَ يَٰقَوْمِ ٱتَّبِعُونِ أَهْدِكُمْ سَبِيلَ ٱلرَّشَادِ ﴿٣٨﴾ يَٰقَوْمِ إِنَّمَا هَٰذِهِ ٱلْحَيَوٰةُ ٱلدُّنْيَا مَتَٰعٌ وَإِنَّ ٱلْءَاخِرَةَ هِىَ دَارُ ٱلْقَرَارِ ﴿٣٩﴾ مَنْ عَمِلَ سَيِّئَةً فَلَا يُجْزَىٰٓ إِلَّا مِثْلَهَا ۖ وَمَنْ عَمِلَ صَٰلِحًا مِّن ذَكَرٍ أَوْ أُنثَىٰ وَهُوَ مُؤْمِنٌ فَأُو۟لَٰٓئِكَ يَدْخُلُونَ ٱلْجَنَّةَ يُرْزَقُونَ فِيهَا بِغَيْرِ حِسَابٍ ﴿٤٠﴾

(٣٤) سوێند بەخوا بەراستی کاتی خۆی یوسف بەڵگە و نیشانەی زۆری بۆ هێنان تا ڕێبازی خواناسی بگرنەبەر، کەچی بەردەوام لە گوماندا بوون، بەرامبەر ئەو بەرنامە و ئاینەی کە بۆی هێنابوون، هەتا ئەو کاتەی وەفاتی کرد، ئەوسا وتتان: ئیتر تەواو هەرگیز خوا دوای ئەم پێغەمبەری تر نانێرێت، هەر بەو شێوەیە خوا کەسانی سەرکەش وگوناهکار و دڵ دانەمەزراو و ڕاڕا گومڕا دەکات.

(٣٥) ئەو کەسانەی کە موجادەلە و گفتوگۆ دەکەن دەربارەی ئایەت و فەرمانەکانی خوا، بێ ئەوەی هیچ بەڵگەیەکیان بۆ هاتبێت، ئەم مجادەلە و گفتوگۆیە زۆر بێزراو و تاوانە لای خوا و لای ئەوانەش کە ئیمانیان هێناوە، هەر بەو شێوەیە خوا مۆر دەنێت بەسەر هەموو خاوەن دڵێکی خۆبەزل زان و ڕق ئەستوور و ستەمکاردا.

(٣٦) ئا لەو گەرمەی قسەی ئیماندارەدا فیرعەون بە هامانی وت: ئەی هامان بورجێکی بەرزم بۆ دروست بکە، بۆ ئەوەی هەندێک هۆکارم دەست بکەوێت!!...

(٣٧) هۆکاری بەرزبوونەوە بۆ ئاسمانەکان، تا لەوێوە سەرکەوم و نهێنیەکان شارەزا ببم تا سەردانێکی خوای موسا بکەم و ببینم!! هەرچەندە من دڵنیام کە درۆزنە!!، ئابەو شێوەیە کاروکردەوە ناشیرینەکان لای فیرعەون جوانکراو، لە ڕێبازی ڕاست و دروست لادرا، بێگومان پیلان و نەخشەی نادروستی فیرعەون هەر لە زەرەردایە.

(٣٨) ئەو کەسەی کە ئیمانی هێنابوو دووبارە هاتەوە قسە وتی: ئەی قەوم و هۆزەکەم شوێنی من بکەون بەقسەی من بکەن ڕێنموویتان دەکەم بۆ ڕێبازی سەرفەرازی و چاکە و چاکەکاری.

(٣٩) ئەی قەوم و هۆزم بێگومان ژیانی ئەم دنیایە تەنها بریتیە لە رابواردنێکی کەم، بەڕاستی ژیانی پاشە ڕۆژ و داهاتوو، هەر ئەو شوێنی ئومێد و ئارام گرتن و حەسانەوەیە بۆ ئیمانداران.

(٤٠) ئەوەی گوناهو هەڵەیەکی کردبێت، تەنها بەقەدەر هەڵە و گوناهەکەی خۆی تۆڵەی لێدەسێنرێت، ئەوەش کە چاکەی کردووە لە پیاوان و ئافرەتان، لە کوڕان و لە کچان لەکاتێکدا کە خاوەنی باوەڕی دامەزراون، ئا ئەوانە دەچنە بەهەشتەوە و بێ سنوور و بێ حساب ڕزق و ڕۆزی هەمەجۆر و هەمە چەشنیان پێدەبەخشرێت.



وَيَٰقَوْمِ مَا لِيٓ أَدْعُوكُمْ إِلَى ٱلنَّجَوٰةِ وَتَدْعُونَنِيٓ إِلَى ٱلنَّارِ ﴿٤١﴾ تَدْعُونَنِي لِأَكْفُرَ بِٱللَّهِ وَأُشْرِكَ بِهِۦ مَا لَيْسَ لِي بِهِۦ عِلْمٌ وَأَنَا۠ أَدْعُوكُمْ إِلَى ٱلْعَزِيزِ ٱلْغَفَّٰرِ ﴿٤٢﴾ لَا جَرَمَ أَنَّمَا تَدْعُونَنِيٓ إِلَيْهِ لَيْسَ لَهُۥ دَعْوَةٌ فِي ٱلدُّنْيَا وَلَا فِي ٱلْءَاخِرَةِ وَأَنَّ مَرَدَّنَآ إِلَى ٱللَّهِ وَأَنَّ ٱلْمُسْرِفِينَ هُمْ أَصْحَٰبُ ٱلنَّارِ ﴿٤٣﴾ فَسَتَذْكُرُونَ مَآ أَقُولُ لَكُمْ وَأُفَوِّضُ أَمْرِيٓ إِلَى ٱللَّهِ إِنَّ ٱللَّهَ بَصِيرٌۢ بِٱلْعِبَادِ ﴿٤٤﴾ فَوَقَىٰهُ ٱللَّهُ سَيِّـَٔاتِ مَا مَكَرُوا۟ وَحَاقَ بِـَٔالِ فِرْعَوْنَ سُوٓءُ ٱلْعَذَابِ ﴿٤٥﴾ ٱلنَّارُ يُعْرَضُونَ عَلَيْهَا غُدُوًّا وَعَشِيًّا وَيَوْمَ تَقُومُ ٱلسَّاعَةُ أَدْخِلُوٓا۟ ءَالَ فِرْعَوْنَ أَشَدَّ ٱلْعَذَابِ ﴿٤٦﴾ وَإِذْ يَتَحَآجُّونَ فِي ٱلنَّارِ فَيَقُولُ ٱلضُّعَفَٰٓؤُا۟ لِلَّذِينَ ٱسْتَكْبَرُوٓا۟ إِنَّا كُنَّا لَكُمْ تَبَعًا فَهَلْ أَنتُم مُّغْنُونَ عَنَّا نَصِيبًا مِّنَ ٱلنَّارِ ﴿٤٧﴾ قَالَ ٱلَّذِينَ ٱسْتَكْبَرُوٓا۟ إِنَّا كُلٌّ فِيهَآ إِنَّ ٱللَّهَ قَدْ حَكَمَ بَيْنَ ٱلْعِبَادِ ﴿٤٨﴾ وَقَالَ ٱلَّذِينَ فِي ٱلنَّارِ لِخَزَنَةِ جَهَنَّمَ ٱدْعُوا۟ رَبَّكُمْ يُخَفِّفْ عَنَّا يَوْمًا مِّنَ ٱلْعَذَابِ ﴿٤٩﴾

(٤١) ئەی قەوم و هـۆزم ئـەوە چیـیـە، خـۆ مـن بانگی ئێوە دەکەم بۆ رزگاریی، بۆ سەرفەرازی بۆ بەهەشت، کـەچی ئێـوە بـانگی مـن دەکـەن، بـۆ خوانەناسی، بۆ سەرگەردانی بۆ دۆزەخ!

(٤٢) بانگم دەکەن تا باوەڕم بە خوا نەمێنێت و هاوەڵ و شەریکی بۆ بڕیار بدەم، بێ هیچ بەڵگەو زانسـتی و زانیاریـەک، لـەکاتێکدا مـن بانگتـان دەکەم بۆلای زاتێک کە زۆر باڵادەستە و زۆریـش لێخۆشبووە...

(٤٣) شتێکی راستەو گومـانی تێدانیـە ئـەوەی کە ئێوە من بانگ دەکەن بـۆ لای خـاوەنی هیـچ بانگەواز و بەرنامـە و پرۆگرامێـک نیـە، نـە لـە دنیادا، نە لە قیامەتیشدا، ئەوەش نـابێت لـەیاد بکەین، کە بەراستیش گەڕانەوەمان بۆ لای خوای گەورەیە، ئەوانـەش تـاوانی زۆر ئـەنجام دەدەن و سەرکەش و لە سنوور ترازاون، ئەوانە نیشتەجێی دۆزەخن.

(٤٤) جا لە ئایندەدا رۆژێک دێت، ئەم قسانەی منتان بێتەوە یاد، ئێسـتاکەش مـن خـۆم وکـارو بارەکانم دەدەمە دەست خواو پشت بەودەبەستم، چونکە بێگومان خوا بینایە بە بەندەکانی.

(٤٥) جا خوای گەورە ئـەو ئیمـانداره ژێـرەی پاراسـت لـە پیلانـی خـراپ و دڕندانـەیان، دارو دەسـتەی فیرعـەونیش سزایەکی زۆر سەختیان تووش بوو...

(٤٦) ئاگری دۆزەخە، بەیانیان و ئێواران، نیشـانیان دەدرێـت، یـاخود پیایـاندا دەچرژێنرێت، لـە(جیـهانی بـەرزەخدا) رۆژی قیامـەتیش فەرمان دەدرێت: ئادەی تاقم و دەستەی فیرعەون بخەنە ناو ئێش و ئازاری زۆر ناخۆشەوە.

(٤٧) ئەو کاتە ئیتر شەڕو کێشە دەست پێدەکەن لەناو ئـاگری دۆزەخـدا، لاواز و چەوسـاوەکان بەدەسـەلاتدارو لـووت بەرزەکان دەڵێن: خۆ بەراستی ئێمە شوێنکەوتەی ئێوە بووین، ئایا ئێوە نـاتوانن تۆزێـک سـزای ئاگرمـان لەسـەر کـەم بکەنەوە؟

(٤٨) لە وەڵامیاندا لووت بەرزەکان دەڵێن: ئێمە هەموومان لەناو ئاگردا گیرمان خواردووە، بێگومـان خـوای گـەورە داوەری کردووە لە نێوان بەندەکانیدا و بڕیارەکانی براوەتەوە.

(٤٩) ئینجا ئەوانەی کە لەناو ئـاگری دۆزەخـدان بـە فریشـتەکانی کـارگێڕیی دۆزەخ دەڵێـن: داوا لـە پـەروەردگارتان بکەن: تەنها رۆژێک سزاو ئازارمان لەسەر کەم بکاتەوە.

قَالُوٓاْ أَوَلَمۡ تَكُ تَأۡتِيكُمۡ رُسُلُكُم بِٱلۡبَيِّنَٰتِۖ قَالُواْ
بَلَىٰۚ قَالُواْ فَٱدۡعُواْۗ وَمَا دُعَٰٓؤُاْ ٱلۡكَٰفِرِينَ إِلَّا فِي ضَلَٰلٍ
(٥٠) إِنَّا لَنَنصُرُ رُسُلَنَا وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ فِي ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا
وَيَوۡمَ يَقُومُ ٱلۡأَشۡهَٰدُ (٥١) يَوۡمَ لَا يَنفَعُ ٱلظَّٰلِمِينَ مَعۡذِرَتُهُمۡۖ
وَلَهُمُ ٱللَّعۡنَةُ وَلَهُمۡ سُوٓءُ ٱلدَّارِ (٥٢) وَلَقَدۡ ءَاتَيۡنَا مُوسَى
ٱلۡهُدَىٰ وَأَوۡرَثۡنَا بَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ ٱلۡكِتَٰبَ (٥٣) هُدٗى
وَذِكۡرَىٰ لِأُوْلِي ٱلۡأَلۡبَٰبِ (٥٤) فَٱصۡبِرۡ إِنَّ وَعۡدَ ٱللَّهِ
حَقّٞ وَٱسۡتَغۡفِرۡ لِذَنۢبِكَ وَسَبِّحۡ بِحَمۡدِ رَبِّكَ بِٱلۡعَشِيِّ
وَٱلۡإِبۡكَٰرِ (٥٥) إِنَّ ٱلَّذِينَ يُجَٰدِلُونَ فِيٓ ءَايَٰتِ
ٱللَّهِ بِغَيۡرِ سُلۡطَٰنٍ أَتَىٰهُمۡ إِن فِي صُدُورِهِمۡ إِلَّا كِبۡرٞ
مَّا هُم بِبَٰلِغِيهِۚ فَٱسۡتَعِذۡ بِٱللَّهِۖ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلسَّمِيعُ
ٱلۡبَصِيرُ (٥٦) لَخَلۡقُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ أَكۡبَرُ مِنۡ
خَلۡقِ ٱلنَّاسِ وَلَٰكِنَّ أَكۡثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعۡلَمُونَ (٥٧)
وَمَا يَسۡتَوِي ٱلۡأَعۡمَىٰ وَٱلۡبَصِيرُ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ
ٱلصَّٰلِحَٰتِ وَلَا ٱلۡمُسِيٓءُۚ قَلِيلٗا مَّا تَتَذَكَّرُونَ (٥٨)

(٥٠) ئـەوانیش لـە وەڵامـی داخوازیەکـەیاندا دەڵێن: باشە، مەگەر پێغەمبەرەکانتان بە بەڵگەو نیشـانەی روون و ئاشـکراوە، رەوانـە نـەکرابوون بۆتان؟ هەمووان بەیەکدەنگ دەڵێن: بەڵێ، راستە، ئینجا فریشتەکان دەڵێـن: دەی کـەوابوو هـەر داوا بکەن و بپاڕێنەوە، بێگومان داخوازی و پاڕانەوەی کافران بەهیچ ناچێت، تازە هیچ نرخێکی نیەوگیرا نابێت.

(٥١) بەڕاسـتی ئێمـە پێغەمبـەرەکانمان و ئەوانەش کە باوەڕیـان هێنـاوە سەر دەخەین، لـە ژیانی دنیادا هەروەها ئەو رۆژەش کـە شـایەتەکان شـایەتی دەدەن (فریشـتەکان شـایەتی بـۆ پێغەمبـەران دەدەن، پێغەمبـەران شـایەتی بـۆ بـانگخوازان دەدەن بـانگخوازان شـایەتن لەسـەر خەڵکی)

(٥٢) لـەو رۆژەدا ستەمکارانِ تکـاو پاڕانـەوەیان بێسوودە و خەڵکیان پێناگەیەنێت، نەفرین هەر بۆ ئەوانـە و هـەر بـۆ ئەوانیشـە جێگـەی ناسـاز و ناخۆش.

(٥٣) سوێند بـەخوا بەڕاستی ئێمە هیدایـەت و رێنموویـمان بەخشی بـە موسـا و تـەوراتیشـمان هێشتەوە لەناو ئـەوەی ئیسـرائیلدا تـا پـەیڕەوی بکەن و پابەندی بن.

(٥٤) کردوشمانە بەهۆی رێنموویی و یادخستنەوە بۆ خاوەن بیر و هۆشەکان.

(٥٥) ئەی پێغەمبەرﷺ بە ئارام و خۆڕاگربە، چونکە بەڕاستی بەڵێن و وادەکانی خوا هەر دێتەدی، داوای لێخۆشبوونیش بکە بۆ گوناهەکانت، تەسبیحات و ستایش و سوپاسی پەروەردگاریشـت بـەردەوام ئـەنجام بـدە، بـە تایبـەت لـە دەمـە و ئێواران و دەمە و بەیانیاندا.

(٥٦) بەڕاستی ئەوانەی کە موجادەلە و گفتوگۆی سەرکەشانە دەکەن و، بە ئەشارەزایی لە ئایەتـەکانی خـوا دەدوێـن بـێ ئەوەی بەڵگەیەکی بەهێزیان پێ بێت، ئەوانە تەنها لە سینەیاندا خۆ بەل زانین هەیە، بەمەرجێک هیـچ کـات ناگەنـە ئـەو ئامانجەی کە هەیانە، کەواتە تۆ پەنا بگرە بە خوا لە شەڕی خوانەناسان چونکە بەڕاستی ئەو زاتە بیسەر و بینایە.

(٥٧) بەڕاستی دروستکردنی ئاسمانەکان و زەوی لە دروستکردنی خەڵکی زۆر گەورە و گرنگترە، بـەڵام زۆربـەی خـەڵکی ئەم راستیانە تێناگەن و پەی پێ نابەن و نایزانن.

(٥٨) کەسانی کوێر لە بەرامبەر چاوساغەوە، وەک یەک نـین، هـەروەها ئەوانـەی کـە باوەڕیـان هێنـاوە و کـاروکردەوەی چاکە ئەنجام دەدەن، لەگەڵ ئەوانەدا کە تاوان وگوناهـ دەکـەن (چوونیـەک نـین)، کـەچی زۆر کـەم خـەڵکی تێدەفکرن و بیردەکەنەوە و بەراورد دەکەن.

إِنَّ ٱلسَّاعَةَ لَآتِيَةٌ لَّا رَيْبَ فِيهَا وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يُؤْمِنُونَ ﴿٥٩﴾ وَقَالَ رَبُّكُمُ ٱدْعُونِىٓ أَسْتَجِبْ لَكُمْ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَسْتَكْبِرُونَ عَنْ عِبَادَتِى سَيَدْخُلُونَ جَهَنَّمَ دَاخِرِينَ ﴿٦٠﴾ ٱللَّهُ ٱلَّذِى جَعَلَ لَكُمُ ٱلَّيْلَ لِتَسْكُنُوا۟ فِيهِ وَٱلنَّهَارَ مُبْصِرًا إِنَّ ٱللَّهَ لَذُو فَضْلٍ عَلَى ٱلنَّاسِ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَشْكُرُونَ ﴿٦١﴾ ذَٰلِكُمُ ٱللَّهُ رَبُّكُمْ خَٰلِقُ كُلِّ شَىْءٍ لَّآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ فَأَنَّىٰ تُؤْفَكُونَ ﴿٦٢﴾ كَذَٰلِكَ يُؤْفَكُ ٱلَّذِينَ كَانُوا۟ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ يَجْحَدُونَ ﴿٦٣﴾ ٱللَّهُ ٱلَّذِى جَعَلَ لَكُمُ ٱلْأَرْضَ قَرَارًا وَٱلسَّمَآءَ بِنَآءً وَصَوَّرَكُمْ فَأَحْسَنَ صُوَرَكُمْ وَرَزَقَكُم مِّنَ ٱلطَّيِّبَٰتِ ذَٰلِكُمُ ٱللَّهُ رَبُّكُمْ فَتَبَارَكَ ٱللَّهُ رَبُّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٦٤﴾ هُوَ ٱلْحَىُّ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ فَٱدْعُوهُ مُخْلِصِينَ لَهُ ٱلدِّينَ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٦٥﴾ ۞ قُلْ إِنِّى نُهِيتُ أَنْ أَعْبُدَ ٱلَّذِينَ تَدْعُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ لَمَّا جَآءَنِىَ ٱلْبَيِّنَٰتُ مِن رَّبِّى وَأُمِرْتُ أَنْ أُسْلِمَ لِرَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٦٦﴾

(٥٩) بەڕاستی ڕۆژی قیامـەت بەڕێوەیـە و هـەر دێت، هیچ گومانیشی تیادانیـە، بـەڵام زۆربـەی خەڵکی ئیمان و باوەڕناهێنن و باوەڕیان پێی نیە.

(٦٠) ئەی خەڵکینە پەروەردگارتان فەرموویەتی: ئێوە هاناو هاوار بۆمن بهێنن؛ ئەوە من دوعاو نزاتـان گیرا دەکـەم، بەڕاسـتی ئەوانـەی خۆیـان بەگەورە دادەنێن ولووت بەرزی دەکـەن لەئاستی پەرسـتنی منـدا، لـەئاییندەدا بەسەرشـۆڕی و خەجاڵەتی‌یەوە دەخرێنە ناو ئاگری دۆزەخەوە.

(٦١) خـوا ئـەو پەروەردگارەیـە شـەوی بـۆ سازاندوون، تا تیایدا ئـارام بگـرن و بحەوێنـەوە، ڕۆژگاریشـی بـۆ ڕۆشـن و ڕوونـاک کردوونەتـەوە، بەڕاستی خوای گەورە خاوەنی بەخشندەی و نـازو نیعمەتی زۆرە بەسەر خەڵکیـەوە، بـەڵام زۆربـەی خەڵکی سوپاسگوزاری ناکەن.

(٦٢) ئەو زاتە خوای ئێوەیە و پەروەردگارتانـە، بەدیهێنەری هەموو شتێکە، هیـچ خوایـەک نیـە جگە لەو، ئیتر ئێوە بـەرەو کوێ دەبرێـن؟ چۆن لادەدرێن لە بەرنامەکەی؟

(٦٣) هەر بەو شێوەیە لادرابوون ئەوانەی کە لـە پێش ئەمانەوە دژایـەتی ئایـەت و فەرمانـەکانی خوایـان دەکـرد و لـە ڕێبازەکـەی لایـان دەدا و دژایەتیان دەکرد (بەڵام کوان ؟! بۆ کوێ چوون ؟! چیان بەسەر هات ؟!).

(٦٤) خوا ئەو زاتەیە کە زەوی بۆ کردوون بەشوێنی سرەوتن و ژیان و حەوانەوە، ئاسمانیشی بەسـەرتانەوە ڕاگرتـووە، ڕووخسـارو شـێوازتانی نەخشـاندووە، بـەجوانترین شـێوەش نەخشـاندویەتی، لـە ڕزق و ڕۆزی چاک و پـاک و بەسـوود بەهرەوەری کردوون، جا ئا ئەوەیە خوای پەروەردگارتان، پاک و بێگەرد و بڵندە ئەو خوایەی کە پـەروەردگاری هـەموو جیهانیانە.

(٦٥) ئەو زاتە هەمیشە و بەردەوام هەر زیندووە، جگە لەو خوایەکی تر نیە، کەوابوو هانا و هاوار و نزاتـان ڕوو بـەو بێت، ملکەچ و فەرمانبەرداری بەرنامە و ئاینەکەی ئەو بن، سـوپاس و سـتایش بـۆ خـوا، کـە پـەروەردگاری هـەموو جیهانیانە.

(٦٦) ئەی پێغەمبەرﷺ پێیان بڵێ: بێگومان من قەدەغەم لێکراوە ئەو شتانە بپەرستم کە ئێوە لە جیـاتی خـوا هانـا و هاواری بـۆ دەبـەن، لـەکاتێکدا بەڵگـە و نیشـانەی زۆر و ئاشـکرام لـە لایـەن پەروەردگارمـەوە پێگەیشتووە و مـن فەرمانم پێ دراوە بە ملکەچی خۆم بدەمە دەست پەروەردگاری هەموو جیهانیان.

هُوَ ٱلَّذِي خَلَقَكُم مِّن تُرَابٍ ثُمَّ مِن نُّطْفَةٍ ثُمَّ مِنْ عَلَقَةٍ ثُمَّ يُخْرِجُكُمْ طِفْلًا ثُمَّ لِتَبْلُغُوٓاْ أَشُدَّكُمْ ثُمَّ لِتَكُونُواْ شُيُوخًا ۚ وَمِنكُم مَّن يُتَوَفَّىٰ مِن قَبْلُ ۖ وَلِتَبْلُغُوٓاْ أَجَلًا مُّسَمًّى وَلَعَلَّكُمْ تَعْقِلُونَ ﴿٦٧﴾ هُوَ ٱلَّذِي يُحْيِۦ وَيُمِيتُ ۖ فَإِذَا قَضَىٰٓ أَمْرًا فَإِنَّمَا يَقُولُ لَهُۥ كُن فَيَكُونُ ﴿٦٨﴾ أَلَمْ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ يُجَٰدِلُونَ فِيٓ ءَايَٰتِ ٱللَّهِ أَنَّىٰ يُصْرَفُونَ ﴿٦٩﴾ ٱلَّذِينَ كَذَّبُواْ بِٱلْكِتَٰبِ وَبِمَآ أَرْسَلْنَا بِهِۦ رُسُلَنَا ۖ فَسَوْفَ يَعْلَمُونَ ﴿٧٠﴾ إِذِ ٱلْأَغْلَٰلُ فِيٓ أَعْنَٰقِهِمْ وَٱلسَّلَٰسِلُ يُسْحَبُونَ ﴿٧١﴾ فِي ٱلْحَمِيمِ ثُمَّ فِي ٱلنَّارِ يُسْجَرُونَ ﴿٧٢﴾ ثُمَّ قِيلَ لَهُمْ أَيْنَ مَا كُنتُمْ تُشْرِكُونَ ﴿٧٣﴾ مِن دُونِ ٱللَّهِ ۖ قَالُواْ ضَلُّواْ عَنَّا بَل لَّمْ نَكُن نَّدْعُواْ مِن قَبْلُ شَيْـًٔا ۚ كَذَٰلِكَ يُضِلُّ ٱللَّهُ ٱلْكَٰفِرِينَ ﴿٧٤﴾ ذَٰلِكُم بِمَا كُنتُمْ تَفْرَحُونَ فِي ٱلْأَرْضِ بِغَيْرِ ٱلْحَقِّ وَبِمَا كُنتُمْ تَمْرَحُونَ ﴿٧٥﴾ ٱدْخُلُوٓاْ أَبْوَٰبَ جَهَنَّمَ خَٰلِدِينَ فِيهَا ۖ فَبِئْسَ مَثْوَى ٱلْمُتَكَبِّرِينَ ﴿٧٦﴾ فَٱصْبِرْ إِنَّ وَعْدَ ٱللَّهِ حَقٌّ ۚ فَإِمَّا نُرِيَنَّكَ بَعْضَ ٱلَّذِي نَعِدُهُمْ أَوْ نَتَوَفَّيَنَّكَ فَإِلَيْنَا يُرْجَعُونَ ﴿٧٧﴾

(٦٧) ئەو خوایە لە خاک ئێوەی دروست کردووە، لەوەودوا لە نوتفە (کە بریتی‌یە لە بەیەکگەیشتنی سەرەمێکوتەیەک کە بەچاو نابینرێت بە هێلکۆکەیەک کە بەقەدەر خاڵێکی بچووکە) لەوەودوا دەبێتە خۆ هەڵواسەرێک پاشان دەرتان دەهێنێت کە منداڵێکی ساوان، بەرەبەرە گەورەتان دەکات بۆ ئەوەی بگەنە ئەوپەڕی هێزو توانــاو ژیریتان، پاشان بۆ ئەوەی ببنە پیرو پەککەوتە، هەشتانە، پێش ئەوەی بگاتە یەکێک لەو قۆناغانە، دەمرێت، هەتانە دەمێنێتەوە بۆ ئەوەی بگاتە کاتێکی دیاریکراو، (خوای گەورە ئەم هەموو راستیانەتان دەخاتە بەرچاو) بۆ ئەوەی عەقڵ و ژیریتان بخەنە کار.

(٦٨) هەر ئەوزاتە، ژیان دەبەخشێت وزیندەوەران و گیانلەبەران دەمرێنێت، جاکاتێک بڕیاری شتێکی دا هەر ئەوەندەیە کە پێی بفەرموێت: ببە، دەست بەجێ دەبێت.

(٦٩) ئایا نابینیت ئەوانەی کە موجادەلەو گفتوگۆی نابەجێ دەکەن دەربارەی ئایەت و فەرمانەکانی خوا، ئەو سەرگەردانانە بەرەو کوێ لادەدرێن لە حەق و راستی، روو لە کوێ دەکەن؟

(٧٠) ئەوانەی کە باوەڕیان نی‌یە بە قورئان و بەو بەرنامە و رێبازەی کە بە پێغەمبەرەکانماندا رەوانەمان کردووە، ئەوانە لە ئایندەدا دەزانن چیان بەسەر دێت و خۆیان دەبیننەوە...

(٧١) کاتێک کۆت و زنجیرەکان دەکرێنە گەردنیان و رادەکێشرێن...

(٧٢) بۆ ناو ئاوی زۆر گەرم، پاشان ئاگریان پێ خۆش دەکرێت و دەبنە سووتەمەنی بۆی...

(٧٣) لەوەودوا پێیان دەوترێت: کوان ئەو شتانەی کە بە هاوەڵتان دادەنا بۆ خوای باڵادەست؟!...

(٧٤) لە جیاتی خوا دەتانپەرست، بەکەساسی و خەجاڵەتیەوە دەڵێن: لێمان ون بوون، دیار نین!!، بەڵکو ئێمە هەر ناوی کەسی ترمان نەدەبرد (دیارە لە ترسدا، یان هەر بیروباوەڕی خۆیان فەرامۆش کردووە)، ئا بەو شێوەیە خوا کافران سەرگەردان و سەرلێشێواو دەکات...

(٧٥) ئا ئەم بارودۆخەی کە ئێستا تیایدا گیرتان خواردووە سەرئەنجامی ئەو کەیف وشادی و سوڕ و سەمایەیە کە لەسەر زەویدا بە ناحەق ئەنجامتان دەدا و کەشخەتان دەکرد بەسەر خەڵکەوە و نازتان دەکرد بەسەریاندا...

(٧٦) دەی.. لە قاپیەکانی دۆزەخەوە بۆ ژوورەوە، ئەوەش بزانن ناشمرن تیایدا و بە هەمیشەیی تیایدا دەمێننەوە، ئای کە شوێن و جێگەی خۆبەزل زانەکان ناخۆش و ناسازە...

(٧٧) جا ئەی پێغەمبەرﷺ ئارامگربە و دڵنیاش بە کە بەڵێنی خوا راست و دروستە و هەر دێتەدی، ئەوسا یان ئەوەیە کە هەندێ لە هەڕەشەکانمان دژیان بەچاوی خۆت دەبینیت، یاخود ئەگەر گیانمان کێشایت و وەفاتت کرد؛ ئەوانە بۆ کوێ دەچن؟!، بەناچاری هەر بۆ لای ئێمە دەبرێنەوە (ئەوسا بەتوندی تۆڵەیان لێ دەسێنین).

وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا رُسُلًا مِّن قَبْلِكَ مِنْهُم مَّن قَصَصْنَا عَلَيْكَ وَمِنْهُم مَّن لَّمْ نَقْصُصْ عَلَيْكَ ۗ وَمَا كَانَ لِرَسُولٍ أَن يَأْتِيَ بِآيَةٍ إِلَّا بِإِذْنِ اللَّهِ ۚ فَإِذَا جَاءَ أَمْرُ اللَّهِ قُضِيَ بِالْحَقِّ وَخَسِرَ هُنَالِكَ الْمُبْطِلُونَ ﴿٧٨﴾ اللَّهُ الَّذِي جَعَلَ لَكُمُ الْأَنْعَامَ لِتَرْكَبُوا مِنْهَا وَمِنْهَا تَأْكُلُونَ ﴿٧٩﴾ وَلَكُمْ فِيهَا مَنَافِعُ وَلِتَبْلُغُوا عَلَيْهَا حَاجَةً فِي صُدُورِكُمْ وَعَلَيْهَا وَعَلَى الْفُلْكِ تُحْمَلُونَ ﴿٨٠﴾ وَيُرِيكُمْ آيَاتِهِ فَأَيَّ آيَاتِ اللَّهِ تُنكِرُونَ ﴿٨١﴾ أَفَلَمْ يَسِيرُوا فِي الْأَرْضِ فَيَنظُرُوا كَيْفَ كَانَ عَاقِبَةُ الَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ ۚ كَانُوا أَكْثَرَ مِنْهُمْ وَأَشَدَّ قُوَّةً وَآثَارًا فِي الْأَرْضِ فَمَا أَغْنَىٰ عَنْهُم مَّا كَانُوا يَكْسِبُونَ ﴿٨٢﴾ فَلَمَّا جَاءَتْهُمْ رُسُلُهُم بِالْبَيِّنَاتِ فَرِحُوا بِمَا عِندَهُم مِّنَ الْعِلْمِ وَحَاقَ بِهِم مَّا كَانُوا بِهِ يَسْتَهْزِئُونَ ﴿٨٣﴾ فَلَمَّا رَأَوْا بَأْسَنَا قَالُوا آمَنَّا بِاللَّهِ وَحْدَهُ وَكَفَرْنَا بِمَا كُنَّا بِهِ مُشْرِكِينَ ﴿٨٤﴾ فَلَمْ يَكُ يَنفَعُهُمْ إِيمَانُهُمْ لَمَّا رَأَوْا بَأْسَنَا ۖ سُنَّتَ اللَّهِ الَّتِي قَدْ خَلَتْ فِي عِبَادِهِ ۖ وَخَسِرَ هُنَالِكَ الْكَافِرُونَ ﴿٨٥﴾

(٧٨) بەراستی ئێمە پێش تۆ پێغەمبەرانی تریشمان ڕەوانە کردووە، هەیانە سەرگوزەشتە و بەسەرهاتیانمان بۆ گێڕاویتەوە، هەشیانە کە سەرگوزەشتە و بەسەرهاتیمان بۆ نەگێڕاویتەوە، هیچ پێغەمبەرێکیش بۆی نەبووە موعجزەیەک پێش بهێنێت بەبێ مۆڵەتی خوای بەدەسەڵات، جاکاتێک فەرمانی خوا هاتبێت، ئەوە جێبەجێ کراوە بەراستی، ئەوکاتە ئیترناحەق و نادروستەکان خەسارەتمەند بوون لەوێدا.

(٧٩) هەر خوایە کە ماڵاتی بۆ ئێوە رام هێناوە، تا هەندێکی بۆ سواری بەکاربهێنن وهەندێکیشی بۆ خۆراک سوودی لیّ وەربگرن.

(٨٠) هەروەها سوودی زۆری ترتان دەست دەکەوێت لەو ماڵاتانەدا، بۆ ئەوەی بەسواری ئەوانە بگەنە ئەو شوێنانەی نیازتان لە دڵدایە بیگەنێ و کاروباری خۆتان ئەنجام بدەن، جا بەسواری ئەو ولاخانە و کەشتیش هەڵدەگیرێن (هاتوچۆیان بۆ ئاسان کردوون).

(٨١) ئەوزاتە بەڵگەو دەسەڵاتی خۆیتان نیشان دەدات، جا بە چ بەڵگەو نیشانە و موعجزەیەکی خوایی ئێوە بڕوا ناکەن و دژی دەوەستن؟!

(٨٢) ئایا ئەوە بەزەویدا نەگەڕاون تا تەماشا بکەن کە چیمان بەسەر قەوم و خەڵکانی پێش ئەماندا هێناوە و سەرئەنجامیان چۆن بووە، ئەوانە زۆر لەمان زیاتر بوون و هێزیان لەمان زۆرتر بوو، شوێنەواریان لەزەویدا ئاشکراتربوو بێگومان ئەو کاروکردەوە نادروستەی کە دەیانکرد هیچ فریایان نەکەوت و رزگاری نەکردن.

(٨٣) جا کاتێک کە پێغەمبەرەکانیان بە بەڵگە و نیشانەی تەواوەوە بۆیان ڕەوانە کرا، لەجیاتی ئەوەی باوەڕیان پێ بهێنن خۆیان دڵخۆش کرد بەو رادە کەمەی کە لە زانست و زانیاری هەیانبوو سەرئەنجام هەرەشەی خوا لەسەرزاری پێغەمبەراندا یەخەی پێگرتن و ئەوەی کە ئەوان گاڵتەیان پێدەکرد دەستەو یەخەیان بوو، فەوتاندنی.

(٨٤) جا کاتیّ کە تۆڵە و سزای ئێمەیان بینی و دڵنیا بوون کە رزگاریان نابێت وتیان: ئیتر ئێمە باوەڕمان بە تاک و تەنهایی خوا هێناوە (جگە لەو کەسی تر ناپەرستین)، بێ باوەڕیش بووین بەو شتانەی کە دامانابوو بەهاوەڵی خوای پەروەردگار و پەشیمانین.

(٨٥) جا بێگومان ئیمانی ئاوا سوودی نەبووە بۆیان، کاتێک تۆڵە و خەشم و قینی ئێمە دەبینن و لە ترساندا باوەڕ دەهێنن، چونکە ئەمە بەراستی بەرنامەی خوایە بۆ بەندەکای بەدرێژایی زەمانە دەبێت لە تەواوی ئازادیدا، بێ ترس و.زۆر باوەڕی پێبکەن، باوەڕی تەنگانە و کاتی تیاچوون پەسەند نیە، ئا لەو شوێنەدا ئیتر کافرو بێبڕواکان خەسارەتمەندیی و زەرەری بێسنووریان بۆ مایەوە.

سُورَةُ فُصِّلَتْ

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

حمٓ ﴿١﴾ تَنزِيلٌ مِّنَ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ ﴿٢﴾ كِتَٰبٌ فُصِّلَتْ ءَايَٰتُهُۥ قُرْءَانًا عَرَبِيًّا لِّقَوْمٍ يَعْلَمُونَ ﴿٣﴾ بَشِيرًا وَنَذِيرًا فَأَعْرَضَ أَكْثَرُهُمْ فَهُمْ لَا يَسْمَعُونَ ﴿٤﴾ وَقَالُوا۟ قُلُوبُنَا فِىٓ أَكِنَّةٍ مِّمَّا تَدْعُونَآ إِلَيْهِ وَفِىٓ ءَاذَانِنَا وَقْرٌ وَمِنۢ بَيْنِنَا وَبَيْنِكَ حِجَابٌ فَٱعْمَلْ إِنَّنَا عَٰمِلُونَ ﴿٥﴾ قُلْ إِنَّمَآ أَنَا۠ بَشَرٌ مِّثْلُكُمْ يُوحَىٰٓ إِلَىَّ أَنَّمَآ إِلَٰهُكُمْ إِلَٰهٌ وَٰحِدٌ فَٱسْتَقِيمُوٓا۟ إِلَيْهِ وَٱسْتَغْفِرُوهُ ۗ وَوَيْلٌ لِّلْمُشْرِكِينَ ﴿٦﴾ ٱلَّذِينَ لَا يُؤْتُونَ ٱلزَّكَوٰةَ وَهُم بِٱلْءَاخِرَةِ هُمْ كَٰفِرُونَ ﴿٧﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ لَهُمْ أَجْرٌ غَيْرُ مَمْنُونٍ ﴿٨﴾ ۞ قُلْ أَئِنَّكُمْ لَتَكْفُرُونَ بِٱلَّذِى خَلَقَ ٱلْأَرْضَ فِى يَوْمَيْنِ وَتَجْعَلُونَ لَهُۥٓ أَندَادًا ۚ ذَٰلِكَ رَبُّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٩﴾ وَجَعَلَ فِيهَا رَوَٰسِىَ مِن فَوْقِهَا وَبَٰرَكَ فِيهَا وَقَدَّرَ فِيهَآ أَقْوَٰتَهَا فِىٓ أَرْبَعَةِ أَيَّامٍ سَوَآءً لِّلسَّآئِلِينَ ﴿١٠﴾ ثُمَّ ٱسْتَوَىٰٓ إِلَى ٱلسَّمَآءِ وَهِىَ دُخَانٌ فَقَالَ لَهَا وَلِلْأَرْضِ ٱئْتِيَا طَوْعًا أَوْ كَرْهًا قَالَتَآ أَتَيْنَا طَآئِعِينَ ﴿١١﴾



سورەتی (فصلت)

بەناوی خوای بەخشندە و میهرەبان

(١) سەرنجی سەرەتای سوورەتی (البقرة) بدە.

(٢) ئەم قورئانە دابەزێنراوە لەلایەن پەروەردگاری خاوەن بەزەیی و میهرەبانەوە .

(٣) کتێبێکە؛ ئایەت و فەرمانەکانی بەش کراوە و جیاکراوەتەوە (ئیمان وکوفر، حەڵاڵ وحەرام چاکە وخراپە...هتد)، قورئانێکە بە عەرەبیەکی رەوان بۆ کەسانێک کە دەیزانن و شارەزاییان هەیە (لە زمانەوانی و زانستەکان).

(٤) هەر ئەم قورئانە مژدەبەخشە بەئیمانداران، ترسێنەری کافرانە، کەچی زۆربەی موشریکان پشتیان تێکرد و بەرهەڵستیان کردو نایبیستن.

(٥) وتیشیان: ئێمە دڵەکانمان داپۆشراوە لە ئاستی ئەم بەرنامەیەدا کە تۆ بانگی ئێمە دەکەیت بۆ لای، گوێشمان کەرو قورسە لە ئاستیدا، لە نێوان ئێمە و تۆدا پەردە و بەربەست هەیە، تۆ هەوڵ و کۆششی خۆت بدە، بێگومان ئێمەش هەوڵ و کۆششی خۆمان دەدەین.

ئەی پێغەمبەر ﷺ، پێیان بڵێ: دڵنیابن کە من هەر بەشەرێکم وەک ئێوە، (جیاوازیەکە تەنها ئەوەیە): من وەحی ونیگام بۆ دەکرێت کە بێگومان خوای ئێوە خوایەکی تاک و تەنهایە، کەوابوو ئێوەش رووی تێ بکەن، بەڕاستی بیپەرستن ؛ لە رێبازەکەی لامەدەن، داوای لێخۆشبوونی لێبکەن و چاک بزانن کە وەیل و سزای سەخت بۆ موشریک و هاوەڵگەران ئامادەیە.

(٧) ئەوانەی کە زەکات نادەن و ئەوانەش کە بێ باوەڕن بە رۆژی قیامەت.

(٨) بەڕاستی ئەوانەی کە ئیمان و باوەڕیان هێناوە و کاروکردەوە چاکەکانیان ئەنجامداوە پاداشتی نەبڕاوەیان بۆ هەیە ...

(٩) ئەی پێغەمبەر ﷺ پێیان بڵێ: باشە ئاخر ئێوە باوەڕتان بەو زاتە نیە کە زەوی لە دوو رۆژدا دروست کردووە؟ (ئەڵبەتە ئەو رۆژانە مەگەر خوا خۆی بزانێت درێژیی ماوەکەیان چەندە)، چەند هاوەڵێکیشی بۆ بڕیار دەدەن؟! ئەو بەدیهێنەر و دروستکارە پەروەردگاری هەر هەموو جیهانیان و بوونەوەرە.

(١٠) لەسەر رووکاری زەوی کێوەکانی دامەزراندوە (کە کار دەکەنە سەر ئاوو هەوا، دیمەنی جوان دەسازێنن، لەنگەری دەگرن، رووبەری فراوانتر دەکەن..هتد)بەرەکەتی زۆری تێدا دابین کردووە (وەک نەوت وجۆرەها کانزا، سەرەڕای جیهانی روەک و..هتد)، هەموو رزق و رۆزیەکانی تیادا بڕیارداوە هەمووی لە ماوەی چوار رۆژدا بە دوو رۆژەکەی پێشووشەوە (قەبارە و رەنگ و تام و بۆن و وەرز و شوێنی هەر میوە و دەغڵ و دانێک، هەروەها گیانداران و باڵندەکانیش) تا نیازو داخوازیەکانی ئادەمیزاد جێبەجێ بکات.

(١١) ئینجا ویستی ئاسمان رێک بخات و دروستی بکات لەکاتێکدا کە دوکەڵ بوو، جا بە ئاسمان و زەوی فەرموو: فەرمانبەردار و ملکەچ بن، بەخۆشی خۆتان یان بەزۆر بتانخەمە ژێر دەسەڵاتی خۆمەوە؟! هەردوولا خێرا وتیان: ملکەچی تۆین و چۆن دەفەرمویت وا دەکەین، (بێگومان کارێکی ئاسانە بۆ خوای بەدەسەڵات، زەوی و ئاسمان بێنێتە قسە، چونکە ئادەمیزاد جۆرەها ئامێری هێناوەتە قسە، دەم و زمان و لێویشیان نیە!!).

فَقَضَىٰهُنَّ سَبۡعَ سَمَٰوَاتٖ فِي يَوۡمَيۡنِ وَأَوۡحَىٰ فِي كُلِّ سَمَآءٍ أَمۡرَهَاۚ وَزَيَّنَّا ٱلسَّمَآءَ ٱلدُّنۡيَا بِمَصَٰبِيحَ وَحِفۡظٗاۚ ذَٰلِكَ تَقۡدِيرُ ٱلۡعَزِيزِ ٱلۡعَلِيمِ ﴿١٢﴾ فَإِنۡ أَعۡرَضُواْ فَقُلۡ أَنذَرۡتُكُمۡ صَٰعِقَةٗ مِّثۡلَ صَٰعِقَةِ عَادٖ وَثَمُودَ ﴿١٣﴾ إِذۡ جَآءَتۡهُمُ ٱلرُّسُلُ مِنۢ بَيۡنِ أَيۡدِيهِمۡ وَمِنۡ خَلۡفِهِمۡ أَلَّا تَعۡبُدُوٓاْ إِلَّا ٱللَّهَۖ قَالُواْ لَوۡ شَآءَ رَبُّنَا لَأَنزَلَ مَلَٰٓئِكَةٗ فَإِنَّا بِمَآ أُرۡسِلۡتُم بِهِۦ كَٰفِرُونَ ﴿١٤﴾ فَأَمَّا عَادٞ فَٱسۡتَكۡبَرُواْ فِي ٱلۡأَرۡضِ بِغَيۡرِ ٱلۡحَقِّ وَقَالُواْ مَنۡ أَشَدُّ مِنَّا قُوَّةًۖ أَوَلَمۡ يَرَوۡاْ أَنَّ ٱللَّهَ ٱلَّذِي خَلَقَهُمۡ هُوَ أَشَدُّ مِنۡهُمۡ قُوَّةٗۖ وَكَانُواْ بِـَٔايَٰتِنَا يَجۡحَدُونَ ﴿١٥﴾ فَأَرۡسَلۡنَا عَلَيۡهِمۡ رِيحٗا صَرۡصَرٗا فِيٓ أَيَّامٖ نَّحِسَاتٖ لِّنُذِيقَهُمۡ عَذَابَ ٱلۡخِزۡيِ فِي ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَاۖ وَلَعَذَابُ ٱلۡأٓخِرَةِ أَخۡزَىٰۖ وَهُمۡ لَا يُنصَرُونَ ﴿١٦﴾ وَأَمَّا ثَمُودُ فَهَدَيۡنَٰهُمۡ فَٱسۡتَحَبُّواْ ٱلۡعَمَىٰ عَلَى ٱلۡهُدَىٰ فَأَخَذَتۡهُمۡ صَٰعِقَةُ ٱلۡعَذَابِ ٱلۡهُونِ بِمَا كَانُواْ يَكۡسِبُونَ ﴿١٧﴾ وَنَجَّيۡنَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَكَانُواْ يَتَّقُونَ ﴿١٨﴾ وَيَوۡمَ يُحۡشَرُ أَعۡدَآءُ ٱللَّهِ إِلَى ٱلنَّارِ فَهُمۡ يُوزَعُونَ ﴿١٩﴾ حَتَّىٰٓ إِذَا مَا جَآءُوهَا شَهِدَ عَلَيۡهِمۡ سَمۡعُهُمۡ وَأَبۡصَٰرُهُمۡ وَجُلُودُهُم بِمَا كَانُواْ يَعۡمَلُونَ ﴿٢٠﴾

(١٢) لە ماوەی دوو ڕۆژدا (لەو ڕۆژانەی کە هەر خۆی ماوەیان دەزانێت) ئاسمانی کردە حەوت چین و فەرمانی بۆ هەر چینێکیش دەرکرد، ئینجا دەفەرموێت: ئاسمانی دنیاشمان ڕازاندەوە بە ئەستێرەوکردمانە چراخان و کردمانە هۆی پاراستن، (لە شەڕی شەیتانەکان)، ئا ئەو شتانە هەمووی بە ویست و فەرمانی زاتێکە کە باڵادەست و زانایە.

(١٣) جا ئەگەر لەگەڵ ئەم هەموو باسی دەسەلات و توانایی و زانایی خوای گەورەدا پشتیان هەڵکرد و گوێیان نەگرت، پێیان بڵێ: من ئاگادارتان دەکەم لەوەی کە شریخە و بروسکە وکارەساتێکتان بەسەر بێت، وەک ئەوەی کە بەسەر عاد و ثمود هات...

(١٤) کاتێک پێغەمبەرانیان بۆ ڕەوانە کرا لە پێشتر و دواتریشدا، بەم فەرمانە پیرۆزە کە: جگە لە خوا کەسی تر مەپەرستن، کەچی وتیان: ئەگەر پەروەردگارمان بیویستایە ڕێنمویمان بکات ئێوەی نە دەنارد؛ بەڵکو فریشتەی دادەبەزان!! کەوابوو ئێمە بێگومان بڕوا ناکەین بەو پەیامەی کە بە ئێوەدا ڕەوانەکراوە.

(١٥) ئەوسا قەومی عاد بەناحەق خۆیان بەزل و گەورەزانی لە زەویدا و وتیان: کێ هەیە بە ئەندازەی ئێمە هێزو دەسەلاتی هەبێت؟ باشە ئایا ئەوە نەیانزانی بەڕاستی ئەو خوایەی کە دروستی کردوون، ئەو لەوان هێزی زۆر زیاترە (بەڵکو هەر بەراورد ناکرێت) و ئەوانە هەر ئینکاری ئایەت و موعجیزەکانی ئێمەیان دەکرد.

(١٦) ئەوسا ئیتر ئێمە بایەکی توندو زۆر ساردمان هەڵکردە سەریان لە چەند ڕۆژێکی شومدا، تا هەر لە ژیانی دنیادا بەسزای سەرشۆڕیان بگەیەنین و تالاو بکەین بەگەروویاندا، بێگومان سزای قیامەت زیاتر سەرشۆڕکەرو تاڵترە و ئەوانە سەرفراز و ڕزگار نابن.

(١٧) هۆزی ـ ثمود ـ یشمان ڕێنموویی کرد بۆ ئیمان و چاکە؛ کەچی حەزیان بەکوێری کرد، تا چاوساغی و هیدایەت و ئیمان، هەر بۆیە ئەوانیش سزای سەرشۆڕکەر و سەرگەردانکەر یەخەی پێگرتن بەهۆی ئەو کارو کردەوانەی کە دەیانکرد.

(١٨) ئەوسا ئەوانەی کە ئیمان و باوەڕیان هێنابوو ڕزگارمان کردن، کەسانێکی بە تەقواو خواناسیش بوون.

(١٩) ڕۆژێک دێت دوژمنانی خوا تێکرا کۆ دەکرێنەوە و کێش دەکرێن بەرەو ئاگری دۆزەخ، بەرو دوایان پاڵەپەستۆیانە .

(٢٠) هەتا کاتێک دەگەنە ئاستی ئاگرەکە گوێیان و چاوەکانیان و پێستەکانیان شایەتیان لەسەر دەدات کە چ کارو کردەوەیەکی نادروست و خراپیان ئەنجام دەدا.

وَقَالُوا لِجُلُودِهِمْ لِمَ شَهِدتُّمْ عَلَيْنَا قَالُوا أَنطَقَنَا اللَّهُ الَّذِي أَنطَقَ كُلَّ شَيْءٍ وَهُوَ خَلَقَكُمْ أَوَّلَ مَرَّةٍ وَإِلَيْهِ تُرْجَعُونَ ﴿٢١﴾ وَمَا كُنتُمْ تَسْتَتِرُونَ أَن يَشْهَدَ عَلَيْكُمْ سَمْعُكُمْ وَلَا أَبْصَارُكُمْ وَلَا جُلُودُكُمْ وَلَٰكِن ظَنَنتُمْ أَنَّ اللَّهَ لَا يَعْلَمُ كَثِيرًا مِّمَّا تَعْمَلُونَ ﴿٢٢﴾ وَذَٰلِكُمْ ظَنُّكُمُ الَّذِي ظَنَنتُم بِرَبِّكُمْ أَرْدَاكُمْ فَأَصْبَحْتُم مِّنَ الْخَاسِرِينَ ﴿٢٣﴾ فَإِن يَصْبِرُوا فَالنَّارُ مَثْوًى لَّهُمْ وَإِن يَسْتَعْتِبُوا فَمَا هُم مِّنَ الْمُعْتَبِينَ ﴿٢٤﴾ ۞ وَقَيَّضْنَا لَهُمْ قُرَنَاءَ فَزَيَّنُوا لَهُم مَّا بَيْنَ أَيْدِيهِمْ وَمَا خَلْفَهُمْ وَحَقَّ عَلَيْهِمُ الْقَوْلُ فِي أُمَمٍ قَدْ خَلَتْ مِن قَبْلِهِم مِّنَ الْجِنِّ وَالْإِنسِ إِنَّهُمْ كَانُوا خَاسِرِينَ ﴿٢٥﴾ وَقَالَ الَّذِينَ كَفَرُوا لَا تَسْمَعُوا لِهَٰذَا الْقُرْآنِ وَالْغَوْا فِيهِ لَعَلَّكُمْ تَغْلِبُونَ ﴿٢٦﴾ فَلَنُذِيقَنَّ الَّذِينَ كَفَرُوا عَذَابًا شَدِيدًا وَلَنَجْزِيَنَّهُمْ أَسْوَأَ الَّذِي كَانُوا يَعْمَلُونَ ﴿٢٧﴾ ذَٰلِكَ جَزَاءُ أَعْدَاءِ اللَّهِ النَّارُ لَهُمْ فِيهَا دَارُ الْخُلْدِ جَزَاءً بِمَا كَانُوا بِآيَاتِنَا يَجْحَدُونَ ﴿٢٨﴾ وَقَالَ الَّذِينَ كَفَرُوا رَبَّنَا أَرِنَا اللَّذَيْنِ أَضَلَّانَا مِنَ الْجِنِّ وَالْإِنسِ نَجْعَلْهُمَا تَحْتَ أَقْدَامِنَا لِيَكُونَا مِنَ الْأَسْفَلِينَ ﴿٢٩﴾



(٢١) ئەوسا بەغەمباریەوە بەپێستی خۆیان دەڵێن : بۆچی شایەتیتان لەسەرداین خۆ زەرەرتانە؟ لە وەڵامدا دەڵێن، ئەو خوایە ئێمەی هێناوەتە گوفتار کە دەتوانێت هەموو شتێک بهێنێتە قسە و گفتوگۆ، هەر ئەو زاتەشە کە یەکەمجار بەدیهێناون و هەر بۆلای ئەویش دەبرێنەوە (بێگومان کارێکی ئاسانە بۆخوا چونکە ئادەمیزاد جۆرەها ئامێری هێناوەتە قسە، دەم و زمان و لێویشیان نیە!).

(٢٢) ئێوە کاتی خۆی ئەوەندە غەرڕا بوون، گوناهو تاوانەکانتان نەدەشاردەوە، چونکە مەترسیتان نەبوو کە گوێتان و چاوتان و پێستتان شایەتیتان لەسەر بدات، بەڵام گومانتان وابوو کە بەراستی خوا زۆر ئاگادار نیە بەو کاروکردەوانەی کە ئەنجامی دەدەن.

(٢٣) ئا ئەوەبوو گومانی ناپەسەندتان کە بووتان بەرامبەر پەروەردگارتان؛ ئێستا بوو بەهۆی داخزان وتیاچوونتان و بەوهۆیەوە چوونە ریزی زەرەرمەندانەوە.

(٢٤) جا ئەگەر بەناچاری خۆگری بنوێنن، ئەوە ئاگر جێگەیانە، ئەگەر داوای لێبووردن و چاوپۆشی بکەن چاوپۆشیان لێناکرێت و داوایان لێوەرناگیرێت.

(٢٥) ئەوانە بەهۆی تاوان و سەرکەشیانەوە کەسانێکمان کردە هاوەڵیان کە کاروکردەوەی رابوردوو داهاتوویان بۆ برازێننەوە، تا سەرئەنجام بڕیاری تۆڵە ئەمانیشی گرتەوە وەک کۆمەڵانی پێش ئەمان لە پەری و ئینسانەکان، بەراستی هەر هەموویان زەرەرمەند و دۆڕاون.

(٢٦) بێباوەڕان دەیانوت: گوێ مەگرن بۆ ئەم قورئانە و بیکەن بەگاڵتە و هەرا و هوریا (لەم سەردەمەدا ئەو راگەیاندنەی بەدەست ناحەزانەوەیە ئەو رۆڵە دەبینێت) بۆ ئەوەی ئێوە زاڵ ببن و بیبەنەوە.

(٢٧) (ئەو جۆرە کەسانە بۆ کوێ دەچن) کەوابوو سوێند بەخوا هەر دەبێت تاڵاوی سزای سەخت بکەین بەگەرووی ئەوانەی کە بێباوەڕ بوون، لە ئایندەشدا بە خراپتر لەو کارو کردەوانەی کە دەیانکرد تۆڵەیان لێ دەستێنین.

(٢٨) ئا ئەوەیە پاداشتی دوژمنانی خوا هەر ئاگرەکەی دۆزەخە، کە ماڵ و نیشتەجێی هەمیشەییانە، لە تۆڵەی ئەوەی کە سەرسەختانە بەرەنگاری ئایەتەکانی ئێمەیان دەکرد.

(٢٩) لە قیامەتدا ئەوانەی بێباوەڕ بوون وتیان: پەروەردگارا، ئەو دوو دەستەیەمان نیشان بدە لە پەری و ئادەمیزاد کە گومڕایان کردین بیانخەینە ژێر پێمانەوە، تا هەر لە ژێرەوە بن.

إِنَّ ٱلَّذِينَ قَالُواْ رَبُّنَا ٱللَّهُ ثُمَّ ٱسۡتَقَٰمُواْ تَتَنَزَّلُ عَلَيۡهِمُ ٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ أَلَّا تَخَافُواْ وَلَا تَحۡزَنُواْ وَأَبۡشِرُواْ بِٱلۡجَنَّةِ ٱلَّتِي كُنتُمۡ تُوعَدُونَ ﴿٣٠﴾ نَحۡنُ أَوۡلِيَآؤُكُمۡ فِي ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا وَفِي ٱلۡأٓخِرَةِۖ وَلَكُمۡ فِيهَا مَا تَشۡتَهِيٓ أَنفُسُكُمۡ وَلَكُمۡ فِيهَا مَا تَدَّعُونَ ﴿٣١﴾ نُزُلًا مِّنۡ غَفُورٍ رَّحِيمٍ ﴿٣٢﴾ وَمَنۡ أَحۡسَنُ قَوۡلًا مِّمَّن دَعَآ إِلَى ٱللَّهِ وَعَمِلَ صَٰلِحًا وَقَالَ إِنَّنِي مِنَ ٱلۡمُسۡلِمِينَ ﴿٣٣﴾ وَلَا تَسۡتَوِي ٱلۡحَسَنَةُ وَلَا ٱلسَّيِّئَةُۚ ٱدۡفَعۡ بِٱلَّتِي هِيَ أَحۡسَنُ فَإِذَا ٱلَّذِي بَيۡنَكَ وَبَيۡنَهُۥ عَدَٰوَةٞ كَأَنَّهُۥ وَلِيٌّ حَمِيمٞ ﴿٣٤﴾ وَمَا يُلَقَّىٰهَآ إِلَّا ٱلَّذِينَ صَبَرُواْ وَمَا يُلَقَّىٰهَآ إِلَّا ذُو حَظٍّ عَظِيمٖ ﴿٣٥﴾ وَإِمَّا يَنزَغَنَّكَ مِنَ ٱلشَّيۡطَٰنِ نَزۡغٞ فَٱسۡتَعِذۡ بِٱللَّهِۖ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلۡعَلِيمُ ﴿٣٦﴾ وَمِنۡ ءَايَٰتِهِ ٱلَّيۡلُ وَٱلنَّهَارُ وَٱلشَّمۡسُ وَٱلۡقَمَرُۚ لَا تَسۡجُدُواْ لِلشَّمۡسِ وَلَا لِلۡقَمَرِ وَٱسۡجُدُواْۤ لِلَّهِ ٱلَّذِي خَلَقَهُنَّ إِن كُنتُمۡ إِيَّاهُ تَعۡبُدُونَ ﴿٣٧﴾ فَإِنِ ٱسۡتَكۡبَرُواْ فَٱلَّذِينَ عِندَ رَبِّكَ يُسَبِّحُونَ لَهُۥ بِٱلَّيۡلِ وَٱلنَّهَارِ وَهُمۡ لَا يَسۡـَٔمُونَ۩ ﴿٣٨﴾



(٣٠) ئەوانەی بەراستی وتیان: پەروەردگارمان (الله)یە، لەوەودوا بەردەوام پابەندی ئەو ڕێبازە ڕاستە بوون، ئەوە لە سەرەمەرگدا دەستە دەستە فریشتە دادەبەزن بۆلایان، پێیان دەڵێن: هیچ ترس و بیمێکتان نەبێت لە داهاتوو، هیچ غەم و پەژارەیەکتان نەبێت بۆ رابوردوو، مژدەتان لێ بێت بەو بەهەشتەی کە کاتی خۆی بەڵێنتان پێ دەدرا...

(٣١) (خوای گەورە و فریشتەکانیش دەفەرموون): ئێمە یارو یاوەرو هاوکارو پشتیوانی ئێوەین لە ژیانی دنیا و قیامەتیشدا مژدەتان لێ بێت لە بەهەشتدا هەرچی ئارەزووی دەکەن و داوای دەکەن بۆتان ئامادەیە...

(٣٢) ئەو بەهرەیەش لەلایەن پەروەردگارێکەوە پێشکەشتان دەکرێت کە لێبووردە و میهرەبانە.

(٣٣) جا کێ لەو کەسە جوانگفتار ترو قسەی بەجێ ترە کە بانگەوازی کردووە بۆ لای خوا، کاروکردەوەی چاکیشی ئەنجام داوە، وتوشیەتی: بەڕاستی من لە ڕیزی موسڵمانانندام.

(٣٤) بێگومان چاکە و خراپە وەک یەک نین، (تۆ ئەی باوەڕدار) بەجوانترین و چاکترین شێوە بەرەنگاری خراپە و نادروستی بکە، ئەوکاتە ئیتر دەبینیت ئەوەی کە لە نێوان تۆ و ئەودا دوژمنایەتی و ساردیەک هەیە؛ دەبێتە دۆستێکی دڵسۆز و گیانی بەگیانی.

(٣٥) جا کەسیش ناتوانێت بەو ڕەفتارە هەستێت جگە لەوانەی کە ئارامیان گرتووە، هەروەها کەسیش ناتوانێت هەڵوێستی وا بنوێنێت جگە لە کەسێک نەبێت کە خاوەنی بەهرەیەکی گەورە بێت.

(٣٦) ئەی ئیماندار؛ ئەگەر لە لایەن شەیتانەوە خەتەرە و خەیاڵی نادروست لە دڵ ودەروونتدا دروست بوو، ئەوە تۆ داوای یارمەتی لە خوا بکە و پەنای پێ بگرە، چونکە بەڕاستی ئەو زاتە بیسەر و زانایە.

(٣٧) لە نیشانە و بەڵگەکانی دەسەلاتی پەروەردگار شەو و ڕۆژ و خۆر و مانگە، هەرگیز نەکەن سوژدە بۆ خۆر، یان مانگ ببەن، بەڵکو سوژدە تەنها بۆ ئەو خوایە ببەن کە دروستی کردوون، ئەگەر ئێوە خۆتان بە بەندەی ڕاستەقینەی ئەو دەزانن و هەر ئەو دەپەرستن.

(٣٨) جا ئەگەر بێ بڕواکان خۆیان بە زل و گەورە بزانن، (ئەوە وازیان لێ بهێنە) چونکە ئەو فریشتانەی لە خزمەت پەروەردگاری تۆدان شەوو ڕۆژ سەرگەرمی تەسبیحات و ستایشن، هەرگیز بێزاری ڕوویان تێ ناکات خۆیان بەگەورە نازانن.

وَمِنْ ءَايَٰتِهِۦٓ أَنَّكَ تَرَى ٱلْأَرْضَ خَٰشِعَةً فَإِذَآ أَنزَلْنَا عَلَيْهَا ٱلْمَآءَ ٱهْتَزَّتْ وَرَبَتْ ۚ إِنَّ ٱلَّذِىٓ أَحْيَاهَا لَمُحْىِ ٱلْمَوْتَىٰٓ ۚ إِنَّهُۥ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ ﴿٣٩﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ يُلْحِدُونَ فِىٓ ءَايَٰتِنَا لَا يَخْفَوْنَ عَلَيْنَآ ۗ أَفَمَن يُلْقَىٰ فِى ٱلنَّارِ خَيْرٌ أَم مَّن يَأْتِىٓ ءَامِنًا يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ ۚ ٱعْمَلُوا۟ مَا شِئْتُمْ ۖ إِنَّهُۥ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ ﴿٤٠﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ بِٱلذِّكْرِ لَمَّا جَآءَهُمْ ۖ وَإِنَّهُۥ لَكِتَٰبٌ عَزِيزٌ ﴿٤١﴾ لَّا يَأْتِيهِ ٱلْبَٰطِلُ مِنۢ بَيْنِ يَدَيْهِ وَلَا مِنْ خَلْفِهِۦ ۖ تَنزِيلٌ مِّنْ حَكِيمٍ حَمِيدٍ ﴿٤٢﴾ مَّا يُقَالُ لَكَ إِلَّا مَا قَدْ قِيلَ لِلرُّسُلِ مِن قَبْلِكَ ۚ إِنَّ رَبَّكَ لَذُو مَغْفِرَةٍ وَذُو عِقَابٍ أَلِيمٍ ﴿٤٣﴾ وَلَوْ جَعَلْنَٰهُ قُرْءَانًا أَعْجَمِيًّا لَّقَالُوا۟ لَوْلَا فُصِّلَتْ ءَايَٰتُهُۥٓ ۖ ءَا۬عْجَمِىٌّ وَعَرَبِىٌّ ۗ قُلْ هُوَ لِلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ هُدًى وَشِفَآءٌ ۖ وَٱلَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ فِىٓ ءَاذَانِهِمْ وَقْرٌ وَهُوَ عَلَيْهِمْ عَمًى ۚ أُو۟لَٰٓئِكَ يُنَادَوْنَ مِن مَّكَانٍۭ بَعِيدٍ ﴿٤٤﴾ وَلَقَدْ ءَاتَيْنَا مُوسَى ٱلْكِتَٰبَ فَٱخْتُلِفَ فِيهِ ۗ وَلَوْلَا كَلِمَةٌ سَبَقَتْ مِن رَّبِّكَ لَقُضِىَ بَيْنَهُمْ ۚ وَإِنَّهُمْ لَفِى شَكٍّ مِّنْهُ مُرِيبٍ ﴿٤٥﴾ مَّنْ عَمِلَ صَٰلِحًا فَلِنَفْسِهِۦ ۖ وَمَنْ أَسَآءَ فَعَلَيْهَا ۗ وَمَا رَبُّكَ بِظَلَّٰمٍ لِّلْعَبِيدِ ﴿٤٦﴾

(٣٩) لە بەڵگە و نیشانەکانی خوا ئەوەیە کە دەبینیت زەوی کش وماتە، جا کاتێک باران بەسەریدا دەبارێنین دەخرۆشێت و گەشە و نەش و نما دەکات، چونکە بەڕاستی ئەو زاتەی کە زەوی زیندوو کردەوە، مردووانیش زیندوو دەکاتەوە، بێگومان ئەو خوایە دەسەلاتی بەسەر هەموو شتێکدا هەیە..

(٤٠) بەڕاستی ئەوانەی کە سەرسەخت و بێبڕوان و دژایەتی ئایەت و فەرمانەکانی ئێمە دەکەن و لێی لادەدەن، خۆیان ناشارنەوە لە ئێمە، باشە، ئەوەی فڕێ بدرێتە ناو ئاگری دۆزەخەوە چاکترە یان ئەو کەسەی کە بەدڵنیایی و ئارامی و هێمنیەوە دێت لە ڕۆژی قیامەتدا و بەرەو بەهەشت بەڕێزەوە بەڕێ دەکرێت؟! ئەی بێ باوەڕان هەرچیتان لە دەست دێت بیکەن، چونکە لە دەستی خوا دەرناچن، دڵنیاش بن خوا بینایە بەو کردەوانەی کە دەیکەن .

(٤١) بەراستی ئەوانەی کە باوەڕیان نەبووە بەو قورئانە لەکاتێکدا بۆیان هات، بێگومان ئەو قورئانەش کتێبێکی زۆر بەنرخ و ناوازە و سەرکەوتووە...

(٤٢) هیچ ناحەقی و نادروستی و ناتەواویەک رووی تێ ناکات لە هیچ کاتێکدا و لەهیچ لایەکەوە ڕەوانەکراو و نێردراوی زاتێکە کە خاوەنی حیکمەت و داناییە و شایانی سوپاس و ستایشە.

(٤٣) ئەی پێغەمبەر ﷺ شتێک بە تۆ ناوترێت، کە بە پێغەمبەرانی پێش تۆ نەوترابێت، بەڕاستی پەروەردگاری تۆ خاوەنی لێ بووردن و لێ خۆشبوونە بۆ باوەڕداران و تۆڵەسێنەری بەئازار و بەئێشە لە بێباوەڕان.

(٤٤) ئەگەر ئەم قورئانەمان بەزمانی گەلانی تر بناردایە، ئەوە بێ باوەڕان دەیانوت: ئایا نەدەبوو ئایەتەکانی روون و ئاشکرا بوایە و بەزمانی خۆمان بوایە، چۆن دەبێت قورئان بە زمانی بێگانە بێت؟ لەکاتێکدا محمد ﷺ بە عەرەبی دەدوێت؟! ئەی پێغەمبەر ﷺ پێیان بڵێ: ئەم قورئانە بۆ ئەوانەی باوەڕیان هێناوە هیدایەت و ڕێنموویی و شیفایە و چارەسەری هەموو دەرد و نەخۆشیەکان دەکات، جا ئەوانەی کە باوەڕ ناهێنن گوێچکەیان کەڕە و بەشتی تر ئاخنراوە، هەروەها کوێرن لە ئاستیدا، ئەوانە هەروەک لە دوورەوە بانگیان لێ بکرێت وایە (نە دەنگەکە بە چاکی دەبیسن، نە ڕەنگەکە بە روونی دەبینن)

(٤٥) سوێند بەخوا بەڕاستی تەوراتمان بەخشی بە مووسا، کەچی ناکۆکی تیادا کرا، خۆ ئەگەر بڕیارێکی پێشتر لە لایەن پەروەردگارتەوە نەبوایە، (کە تۆڵە لە کافران بخاتە قیامەت) ئەوە لە ناوی دەبردن، بێگومان ئەوان هەر لە شک وگومانێکی بێ سەر و بندان کە خەڵکیش دەخاتە گومانەوە.

(٤٦) ئەوەی چاکە بکات پاداشتی چاکەکەی بۆ خۆیەتی، ئەوەش کە خراپە و تاوان بکات هەر لەسەر خۆی دەکەوێت، دڵنیابە کە پەروەردگاری تۆ بچوکترین ستەم لە بەندەکانی ناکات.



۞ إِلَيۡهِ يُرَدُّ عِلۡمُ ٱلسَّاعَةِۚ وَمَا تَخۡرُجُ مِن ثَمَرَٰتٖ مِّنۡ أَكۡمَامِهَا وَمَا تَحۡمِلُ مِنۡ أُنثَىٰ وَلَا تَضَعُ إِلَّا بِعِلۡمِهِۦۚ وَيَوۡمَ يُنَادِيهِمۡ أَيۡنَ شُرَكَآءِي قَالُوٓاْ ءَاذَنَّٰكَ مَا مِنَّا مِن شَهِيدٖ ﴿٤٧﴾ وَضَلَّ عَنۡهُم مَّا كَانُواْ يَدۡعُونَ مِن قَبۡلُۖ وَظَنُّواْ مَا لَهُم مِّن مَّحِيصٖ ﴿٤٨﴾ لَّا يَسۡـَٔمُ ٱلۡإِنسَٰنُ مِن دُعَآءِ ٱلۡخَيۡرِ وَإِن مَّسَّهُ ٱلشَّرُّ فَيَـُٔوسٞ قَنُوطٞ ﴿٤٩﴾ وَلَئِنۡ أَذَقۡنَٰهُ رَحۡمَةٗ مِّنَّا مِنۢ بَعۡدِ ضَرَّآءَ مَسَّتۡهُ لَيَقُولَنَّ هَٰذَا لِي وَمَآ أَظُنُّ ٱلسَّاعَةَ قَآئِمَةٗ وَلَئِن رُّجِعۡتُ إِلَىٰ رَبِّيٓ إِنَّ لِي عِندَهُۥ لَلۡحُسۡنَىٰۚ فَلَنُنَبِّئَنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ بِمَا عَمِلُواْ وَلَنُذِيقَنَّهُم مِّنۡ عَذَابٍ غَلِيظٖ ﴿٥٠﴾ وَإِذَآ أَنۡعَمۡنَا عَلَى ٱلۡإِنسَٰنِ أَعۡرَضَ وَنَـَٔا بِجَانِبِهِۦ وَإِذَا مَسَّهُ ٱلشَّرُّ فَذُو دُعَآءٍ عَرِيضٖ ﴿٥١﴾ قُلۡ أَرَءَيۡتُمۡ إِن كَانَ مِنۡ عِندِ ٱللَّهِ ثُمَّ كَفَرۡتُم بِهِۦ مَنۡ أَضَلُّ مِمَّنۡ هُوَ فِي شِقَاقِۭ بَعِيدٖ ﴿٥٢﴾ سَنُرِيهِمۡ ءَايَٰتِنَا فِي ٱلۡأٓفَاقِ وَفِيٓ أَنفُسِهِمۡ حَتَّىٰ يَتَبَيَّنَ لَهُمۡ أَنَّهُ ٱلۡحَقُّۗ أَوَلَمۡ يَكۡفِ بِرَبِّكَ أَنَّهُۥ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ شَهِيدٌ ﴿٥٣﴾ أَلَآ إِنَّهُمۡ فِي مِرۡيَةٖ مِّن لِّقَآءِ رَبِّهِمۡۗ أَلَآ إِنَّهُۥ بِكُلِّ شَيۡءٖ مُّحِيطُۢ ﴿٥٤﴾

(٤٧) زانینی بەرپابوونی ڕۆژی قیامەت تەنها لای خوایە و بۆ لای ئەو دەبرێتەوە، هەرچی بەرو بووم و تووێک لە خونچە و چرۆکەیەوە چەکەرە دەکات خوا ئاگادارە لێی، هیچ مێینەیەک سکی نابێت و بەچکەو بەرهەمەکەی دانانێت تەنها بەئاگاداری خوا نەبێت، (ئا بەو شێوەیە خوا دەسەڵاتەکانی خۆی دەخاتە بەرچاو)، کەچی زۆربەی خەڵکی قەدری نازانن، ئەو ڕۆژەش کە بانگیان دەکات و لێیان دەپرسێت: کوان هاوەڵ و هاوتاکانم؟! ئەوانیش لە وەڵامدا دەڵێن: پەروەردگارا، ئێمە هەواڵت دەدەینێ و جاڕ دەدەین کە کەسمان هەڵەی وانایەت بە دەمماندا و شایەتی لەسەر شتی وانادەین.

(٤٨) ئیتر ئەوەی کە جاران دەیانپەرست و هانا و هاواریان بۆ دەبرد و جێگەی ئومێدیان بوو لێیان ون بوو ونرخی نەما، دڵنیاش بوون کە ئیتر هیچ چارە و ڕزگار بوونێکیان نیە.

(٤٩) ئادەمیزاد هەرگیز بێزار نابێت لە داخوازی چاکە و خۆشی و ئاسودەیی بۆ خۆی، خۆ ئەگەر ناخۆشیەکی تووش بێت، ئەوە نائومێد و بێ هیوایە.

(٥٠) سوێند بە خوا ئەگەر ئادەمیزاد خێرو خۆشی بەسەردا بڕێژین و پێ بچێژین، لە دوای ئەو تەنگانەیەی کە تووشی هاتبوو، بە متمانەیەکی زۆرەوە دەڵێت: ئەمە بەرەنجی شانی خۆم پەیدام کردووە و خوا خۆشی دەوێم، وا بزانم قیامەت زۆر دوورە و ڕەنگە هەر نەشبێت، خۆ ئەگەر بمگێڕنەوە بۆ لای پەروەردگارم، ئەوە دڵنیام کە خۆشی و ناز و نیعمەتم لای ئەو؛ بۆ ئامادەیە، بێگومان ئەوانەی کە بێباوەڕ بوون ئەو کارو کردەوە ناشیرینانەیان دەخەینە ڕوو و هەواڵیان پێ دەدەین، هەروەها سزای سەخت و دژوارو ناخۆشیان پێ دەچەژین لە ناو دۆزەخدا.

(٥١) زۆربەی ئادەمیزاد کاتێک ناز و نیعمەتی بەسەردا بڕێژین پشت هەڵدەکات و سەرپێچی دەکات و ملکەچی ڕاستی نابێت و خۆ بەزل و گەورە دەزانێت و بەلای خۆیدا دایدەتاشێت، کاتێکیش ناخۆشی و نەهامەتی تووشهات، ئەوە دۆعا و نزا و پاڕانەوەی زۆر بەگەرم و کوڵ و پان و پۆڕە !!

(٥٢) ئەی پێغەمبەرﷺ پێیان بڵێ: هەواڵم بدەنێ، باشە؛ ئەگەر ئەم قورئانە لەلایەن خواوە بێت، پاشان ئێوەش بڕواتان پێی نەبێت، دەزانن چ سەرئەنجامێکی سامناک چاوەڕێتانە؟، جا ئیتر کێ هەیە لە ئێوە سەرسەختترو لاڕێتر لەوەی کە ڕێگەی جیاو دوور لە ڕاستی گرتبێتە بەر.

(٥٣) ئێمە لە ئایندەدا بەڵگە و نیشانەی سەرسوڕهێنەریان نیشان دەدەین لە ئاسۆکانی بوونەوەرداو لە خودی خۆیشیاندا (بێگومان ئاشکرایە کە لە سەردەمی زانستیدا چەندە نهێنیەکانی بوونەوەر ئاشکرا بووە.. زاناکان بەگشتی و زاناکانی ئەستێرەناسی سەرگەردانن لە وردەکاری و دامەزراوی و گەورەیی و فراوانی ئەم گەردوونە، هەروەها لە ئاڵۆزی جەستەیی وعەقڵیی و دەروونی ئادەمیزاد)، ئەمەش بۆ ئەوەی تا چاک بۆیان ڕوون بێت و دڵنیابن کە ئەو زاتە حەق و ڕاست و ڕەوایە، ئایا شایەتی پەروەردگارت بەس نیە کە بێگومان ئاگا و زانایە بە هەموو شتێک؟!

(٥٤) (لەگەڵ هەموو بەڵگە و نیشانانەدا؛ ئاگادارین بەڕاستی ئەوانە هەر گومانیان هەیە لە بەیەکگەیشتن و ئامادەبوونی بەردەم پەروەردگاریان، ئاگاداربە و دڵنیابە کە ئەوزاتە بە هەموو شتێک زانایە و بە هەموو شتێک ئاگادارە و دەسەڵاتی بەسەر هەموو شتێکدا هەیە و هیچ شتێک لەو یاخی نابێت.

سُورَةُ الشُّورَىٰ

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

حمٓ ﴿١﴾ عٓسٓقٓ ﴿٢﴾ كَذَٰلِكَ يُوحِىٓ إِلَيْكَ وَإِلَى ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِكَ ٱللَّهُ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ ﴿٣﴾ لَهُۥ مَا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِى ٱلْأَرْضِ وَهُوَ ٱلْعَلِىُّ ٱلْعَظِيمُ ﴿٤﴾ تَكَادُ ٱلسَّمَٰوَٰتُ يَتَفَطَّرْنَ مِن فَوْقِهِنَّ وَٱلْمَلَٰٓئِكَةُ يُسَبِّحُونَ بِحَمْدِ رَبِّهِمْ وَيَسْتَغْفِرُونَ لِمَن فِى ٱلْأَرْضِ أَلَآ إِنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلْغَفُورُ ٱلرَّحِيمُ ﴿٥﴾ وَٱلَّذِينَ ٱتَّخَذُوا۟ مِن دُونِهِۦٓ أَوْلِيَآءَ ٱللَّهُ حَفِيظٌ عَلَيْهِمْ وَمَآ أَنتَ عَلَيْهِم بِوَكِيلٍ ﴿٦﴾ وَكَذَٰلِكَ أَوْحَيْنَآ إِلَيْكَ قُرْءَانًا عَرَبِيًّا لِّتُنذِرَ أُمَّ ٱلْقُرَىٰ وَمَنْ حَوْلَهَا وَتُنذِرَ يَوْمَ ٱلْجَمْعِ لَا رَيْبَ فِيهِ فَرِيقٌ فِى ٱلْجَنَّةِ وَفَرِيقٌ فِى ٱلسَّعِيرِ ﴿٧﴾ وَلَوْ شَآءَ ٱللَّهُ لَجَعَلَهُمْ أُمَّةً وَٰحِدَةً وَلَٰكِن يُدْخِلُ مَن يَشَآءُ فِى رَحْمَتِهِۦ وَٱلظَّٰلِمُونَ مَا لَهُم مِّن وَلِىٍّ وَلَا نَصِيرٍ ﴿٨﴾ أَمِ ٱتَّخَذُوا۟ مِن دُونِهِۦٓ أَوْلِيَآءَ فَٱللَّهُ هُوَ ٱلْوَلِىُّ وَهُوَ يُحْىِ ٱلْمَوْتَىٰ وَهُوَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ ﴿٩﴾ وَمَا ٱخْتَلَفْتُمْ فِيهِ مِن شَىْءٍ فَحُكْمُهُۥٓ إِلَى ٱللَّهِ ذَٰلِكُمُ ٱللَّهُ رَبِّى عَلَيْهِ تَوَكَّلْتُ وَإِلَيْهِ أُنِيبُ ﴿١٠﴾

## سوورەتی (الشوری)

### بەناوی خوای بەخشندە و میهرەبان

(١) و(٢) چەند پیتێکێ لە سەرەتای هەندێ لە سوورەتەکانی قورئاندا هاتوون ژمارەیان(١٤) پیتە، نیوەی کۆی پیتەکانی زمانی عەرەبین، بۆ سەلماندنی(إعجاز) و مەزنی وگرنگی قورئان کە لە توانای هیچ کەسدانیە بەو پیتانە کتێبێکی ئاوا بێوێنە دابنێت بەرادەیەکێ هەتا ئەگەر هەموو گرۆی ئادەمیزاد و پەری کۆ ببنەوە بۆ ئەو مەبەستە، بێگومان چەندەها نهێنی تریشی تیایە، زاناکان لە هەندێکی دواون، هەندێکیشیان وتویانە: هەر خوا خۆی زانایە بە نهێنی ئەو پیتانە.

(٣) ئا بەو شێوەیە کە دەیزانیت خوای بالادەست و کاربەجێ وەحی و نیگا دەنێرێت بۆ تۆ ئەی محمد ﷺ و بۆ پێغەمبەرانی پێش تۆیش رەوانە کراوە، لە لایەن خوایەکی بالادەست و داناوە.

(٤) هەرچی لە ئاسمانەکان و زەویدا هەیە هەر هەمووی ئەوزاتە بەدیهێنەر و خاوەنیەتی، بێگومان ئەوخوایە بەرز وبڵندو گەورە وشکۆدارە

(٥) ئاسمانەکان لای سەروویانەوە نزیکە لەبەر گەورەیی و شکۆداری ئەو زاتە لەت ببن و لێک بترازێن، هاوکات فریشتەکان سەرگەرمی تەسبیحات و ستایش و سوپاسگوزاریی پەروەردگاریانن، داوای لێخۆشبوونیش دەکەن بۆ ئیماندارانی سەرزەوی، دڵنیا و ئاگاداربن کە بەراستی ئەو پەروەردگارە هەر ئەو لێخۆشبوو میهرەبانە.

(٦) ئەوانەش لە جیاتی ئەو زاتە کەسانی ترو شتی تر دەکەنە پاڵپشت و پشتگیر، ئەوانە خوا چاودێرە بەسەریانەوە وەنەبێت تۆ ئەی محمد ﷺ کرابیت بە سەرپەرشت بەسەریانەوە.

(٧) ئا بەو شێوەیەی کە دەیزانیت قورئانێکی عەرەبی پاراومان بە وەحی و نیگا بۆ ناردیت، بۆ ئەوەی شاری مەککە و دەوروبەری (کە هەموو زەوی دەگرێتەوە) ئاگادار بکەیت، بەتایبەت ئاگادار و هوشیاریان بکەیت لە رۆژی کۆکردنەوە کە هیچ گومانی تێدا نیە، (ئەو رۆژە خەڵکی دەبنە دوو بەشەوە)، دەستەیەکیان بۆ بەهەشت بەرێ دەکرێن و دەچنە ناو بەهەشتەوە، دەستەکەی تریان بۆ ناو دۆزەخ راپێچ دەکرێت.

(٨) ئەگەر خوا ویستی ببوایە هەموویانی دەکردە میللەتێکی یەکێ پارچە (هەمووان بەناچاریی ئیماندراو چاکێ دەبوون)بەڵام ویستی وایە هەر کەس بیەوێت و شایستە بێت، دەیخاتە سایەی رەحمەت و میهرەبانی و بەهەشتی خۆیەوە، ستەمکارانیش هیچ پشتیوان و یاریدەدەرێکیان نابێت.

(٩) ئایا بێجگە لە خوا پشتیوانی تریان بۆ خۆیان دۆزیوەتەوە؟ کەوابوو هەر خوا خۆی پشتیوانەو هەر خوا خۆی مردووان زیندوو دەکاتەوە و هەر خۆیشی دەسەڵاتی بەسەر هەموو شتێکدا هەیە!

(١٠) لە هەر شتێکدا کێشە و رای جیاوازتان بوو، ئەوە سەرئەنجامی بریارەکەی بۆ خوا خۆی دەگەرێتەوە، چونکە هەر ئەو زاتەیە خوای پەروەردگارم هەر پشت بەو دەبەستم و هەر بۆ لای ئەویش دەگەرێمەوە.

فَاطِرُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۚ جَعَلَ لَكُم مِّنْ أَنفُسِكُمْ أَزْوَٰجًا وَمِنَ ٱلْأَنْعَٰمِ أَزْوَٰجًا ۖ يَذْرَؤُكُمْ فِيهِ ۚ لَيْسَ كَمِثْلِهِۦ شَىْءٌ ۖ وَهُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْبَصِيرُ ﴿١١﴾ لَهُۥ مَقَالِيدُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۖ يَبْسُطُ ٱلرِّزْقَ لِمَن يَشَآءُ وَيَقْدِرُ ۚ إِنَّهُۥ بِكُلِّ شَىْءٍ عَلِيمٌ ﴿١٢﴾ ۞ شَرَعَ لَكُم مِّنَ ٱلدِّينِ مَا وَصَّىٰ بِهِۦ نُوحًا وَٱلَّذِىٓ أَوْحَيْنَآ إِلَيْكَ وَمَا وَصَّيْنَا بِهِۦٓ إِبْرَٰهِيمَ وَمُوسَىٰ وَعِيسَىٰٓ ۖ أَنْ أَقِيمُوا۟ ٱلدِّينَ وَلَا تَتَفَرَّقُوا۟ فِيهِ ۚ كَبُرَ عَلَى ٱلْمُشْرِكِينَ مَا تَدْعُوهُمْ إِلَيْهِ ۚ ٱللَّهُ يَجْتَبِىٓ إِلَيْهِ مَن يَشَآءُ وَيَهْدِىٓ إِلَيْهِ مَن يُنِيبُ ﴿١٣﴾ وَمَا تَفَرَّقُوٓا۟ إِلَّا مِنۢ بَعْدِ مَا جَآءَهُمُ ٱلْعِلْمُ بَغْيًۢا بَيْنَهُمْ ۚ وَلَوْلَا كَلِمَةٌ سَبَقَتْ مِن رَّبِّكَ إِلَىٰٓ أَجَلٍ مُّسَمًّى لَّقُضِىَ بَيْنَهُمْ ۚ وَإِنَّ ٱلَّذِينَ أُورِثُوا۟ ٱلْكِتَٰبَ مِنۢ بَعْدِهِمْ لَفِى شَكٍّ مِّنْهُ مُرِيبٍ ﴿١٤﴾ فَلِذَٰلِكَ فَٱدْعُ ۖ وَٱسْتَقِمْ كَمَآ أُمِرْتَ ۖ وَلَا تَتَّبِعْ أَهْوَآءَهُمْ ۖ وَقُلْ ءَامَنتُ بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ مِن كِتَٰبٍ ۖ وَأُمِرْتُ لِأَعْدِلَ بَيْنَكُمُ ۖ ٱللَّهُ رَبُّنَا وَرَبُّكُمْ ۖ لَنَآ أَعْمَٰلُنَا وَلَكُمْ أَعْمَٰلُكُمْ ۖ لَا حُجَّةَ بَيْنَنَا وَبَيْنَكُمُ ۖ ٱللَّهُ يَجْمَعُ بَيْنَنَا ۖ وَإِلَيْهِ ٱلْمَصِيرُ ﴿١٥﴾

(١١) بێگومـان هـەر ئـەو زاتـە بەدیهێنـەری ئاسمانەکان و زەویە، هەر لە خۆتـان هاوسـەرانی بۆ سازاندوون، لە ئاژەڵ و مەڕو ماڵاتیش جووت، نێر و مێی بۆ فەراهـەم هێنـاون، لـەو ڕێگەیـەوە زاووزێ دەکەن و زۆر دەبـن بۆتـان، هیـچ شتێک نیە لە وێنەی ئەوزاتە، هیچ شـتێک لـەو ناچێت (چونکـە خوایـــە و بەدیهێنـــەرە، چـۆن لـــە بەدیهێنراوەکانی دەچێت) هـەر ئـەویش بیسـەرو بینایە.

(١٢) جڵەوی هـەموو ئاسمانـەکان و زەوی بـە دەست ئەوزاتەیە، رزق و ڕۆزی فراوان دەکـات بـۆ هەرکـەس کـە بیـەوێت، یـان کـەمی دەکـات و سـنورێکی بـۆ دادەنێـت (هەموویشـی بـۆ تاقیکردنەوەیـە لـە لایەکـەوە و بـەڕێوەبردنی کاروباری ژیانە لەلایەکی ترەوە)، بەڕاستی ئـەو خوایە بە هەموو شتێک زانایە.

(١٣) ڕێبازی ئاین و بەرنامەی ژیانی بۆ داناون، ئەوەی کە فەرمانی پێکردووە بە ـ نوح ـ، هـەر بەو شێوەیە قورئانیشی بـۆ تـۆ ئـەی محمد ﷺ وەحی و نیگـا کـردووە و بـە ئیبراهیم و موساو عیسـاشمان ڕاگـەیاندووە کـە ڕێبـازی ئـاین و یەکخواناسی بەرنەدەن و لەسەری پایەدار بن، ئەم بانگەوازە ڕاست و دروستە زۆر بەلای بت پەرست و خوانەناسانەوە گـران و زەحمەتـە، بـەڵام خـوای دانا خۆی کەسانی شایستە هەڵدەبژێرێت بۆ گەیاندنی ئاینەکەی و ڕێنموویی خەڵکانێک دەکات کە بگەڕێنەوە بـۆ لای بەرنامەکەی بەپەرستن و ئەنجامدانی کاروکردەوەی چاک.

(١٤) میللەتانی پێشوو، بەتایبەت گاور وجـوو جیـاوازی و کێشـە و دووبـەرەکی نەکەوتـە نێوانیـان، مەگـەر لـەدوای هاتنی زانستی و زانیاری تەواو بۆیان، کە لەبەر حسادەت و ستەمکاری و لادانیان لە ڕاستە ڕێگا بۆیان دروست بـوو، خۆ ئەگەر بڕیاری پێشووتر لەلایەن پەروەردگارتەوە نەبوایـە کـەتا کـاتێکی دیـاریکراو مۆڵـەتی داون؛ ئـەوە فـەرمانی تیاچوونیان دەردەکرا، بێگومان ئەوانەی کە بوونە میراتگری کتێبی خوا و گەیەنرا بەدەستیان لـە نـەوەکانی داهـاتوو، کەوتنە گومان و دوودڵیەوە، خەڵکیشیان خستە گومانەوە دەربارەی.

(١٥) کەواتە ئەی پێغەمبەر ﷺ تۆ بۆ ئـەوە بانگـەواز بکـە و پایـەدارو دامەزراوبـە، هـەروەک فـەرمانت پـێ دراوە، شوێن ئارەزووی ئەوان مەکەوە و بەئاشـکرا بڵـێ: مـن، بـاوەڕم هێنـاوە بـەو کتێـب و پەیامانـەی خـوا بـۆی نـاردوم و فـەرمانم پێـدراوە کـە دادپـەروەری بـەرپا بکـەم لـە نێوانتـاندا، (الله) پـەروەردگاری ئێمەیـە و ئێوەشـە، بێگومـان دەرەنجامی کردەی خۆمان بۆ خۆمانە و کردەی ئێوەش بۆ خۆتانە، ئیتر هیچ کێشەیەک نیە لە نێوان ئێمە و ئێـوەدا (چونکە حەق دەرکەوت)، ئێمە و ئێوە هەر خوا خۆی کۆمان دەکاتەوە وگەڕانەوەش هەر بۆ لای ئەوە.

وَالَّذِينَ يُحَاجُّونَ فِي اللَّهِ مِنْ بَعْدِ مَا اسْتُجِيبَ لَهُ حُجَّتُهُمْ دَاحِضَةٌ عِندَ رَبِّهِمْ وَعَلَيْهِمْ غَضَبٌ وَلَهُمْ عَذَابٌ شَدِيدٌ ﴿١٦﴾ اللَّهُ الَّذِي أَنزَلَ الْكِتَابَ بِالْحَقِّ وَالْمِيزَانَ وَمَا يُدْرِيكَ لَعَلَّ السَّاعَةَ قَرِيبٌ ﴿١٧﴾ يَسْتَعْجِلُ بِهَا الَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ بِهَا وَالَّذِينَ آمَنُوا مُشْفِقُونَ مِنْهَا وَيَعْلَمُونَ أَنَّهَا الْحَقُّ أَلَا إِنَّ الَّذِينَ يُمَارُونَ فِي السَّاعَةِ لَفِي ضَلَالٍ بَعِيدٍ ﴿١٨﴾ اللَّهُ لَطِيفٌ بِعِبَادِهِ يَرْزُقُ مَن يَشَاءُ وَهُوَ الْقَوِيُّ الْعَزِيزُ ﴿١٩﴾ مَن كَانَ يُرِيدُ حَرْثَ الْآخِرَةِ نَزِدْ لَهُ فِي حَرْثِهِ وَمَن كَانَ يُرِيدُ حَرْثَ الدُّنْيَا نُؤْتِهِ مِنْهَا وَمَا لَهُ فِي الْآخِرَةِ مِن نَّصِيبٍ ﴿٢٠﴾ أَمْ لَهُمْ شُرَكَاءُ شَرَعُوا لَهُم مِّنَ الدِّينِ مَا لَمْ يَأْذَن بِهِ اللَّهُ وَلَوْلَا كَلِمَةُ الْفَصْلِ لَقُضِيَ بَيْنَهُمْ وَإِنَّ الظَّالِمِينَ لَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿٢١﴾ تَرَى الظَّالِمِينَ مُشْفِقِينَ مِمَّا كَسَبُوا وَهُوَ وَاقِعٌ بِهِمْ وَالَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ فِي رَوْضَاتِ الْجَنَّاتِ لَهُم مَّا يَشَاءُونَ عِندَ رَبِّهِمْ ذَلِكَ هُوَ الْفَضْلُ الْكَبِيرُ ﴿٢٢﴾

(١٦) ئەوانەی رەخنە دەگرن و قسە دەکەن دەربارەی ئایینی خوا، دوای ئەوەی کە وەڵام دراوەتەوە و خەڵکی روویان تێکردووە، ئەوانە بەڵگە و رەخنەکانیان پووچەڵە و بەسەریاندا دەدرێتەوە لە لایەن پەروەردگاریانەوە، خەشم و تووڕەیان لەسەرە و سزای سەختیان بۆ ئامادەیە.

(١٧) خوا ئەو زاتەیە کە کتێبە پیرۆزەکانی بە حەق و راستی رەوانە کردووە، هەروەها شەریعەتێکی دابەزاندووە کە وەکو تەرازوو پێوەر وایە بۆ هەڵسەنگاندنی حەق و ناحەق، جا چی تۆی ڤێر کردووە و چووزانی لەوانەیە رۆژی قیامەت و لێپرسینەوە نزیک بێت.

(١٨) ئەوانەی کە باوەڕ بە رۆژی قیامەت ناهێنن پەلە دەکەن و گاڵتەیان پێی دێت و دەڵێن: کوا؟ کەی پێش دێت؟ (بەڵام) ئەوانەی باوەڕیان هێناوە لە بەرپابوونی دەترسن، دەزانن دڵنیان کە بەرپابوونی حەقیقەت و راستەقینەیە، ئاگاداربن لە ڕاستیدا ئەوانەی موجادەلە لەسەر قیامەت دەکەن و بەگومانن لێی، لە بزر بوون و سەر لێشێواویەکی قووڵدا رۆچوون.

(١٩) خوای گەورە زۆر بەسۆزو دلۆڤانە لەگەڵ بەندەکانیدا؛ رزق و رۆزی دەبەخشێت بە هەر کەس بیەوێت(بۆ تاقیکردنەوە)، بەڕاستی ئەو زاتە بەهێز و باڵادەستە.

(٢٠) جا ئەوەی کە بەرهەمی قیامەتی دەوێت و لە دنیادا کارو کردەوەی چاک دەچێنێت، ئێمە پاداشتی هەوڵ و کۆششەکەی بە زیادەوە پێدەبەخشین، ئەوەش کە بەرهەمی دنیای دەوێت؛ هەندێک لە دنیای پێ دەبەخشین، (بەڵام) لە قیامەتدا هیچ جۆرە بەشێکی نیە.

(٢١) (ئایا ئەو بێ باوەڕانە رازین بە بەرنامەی خوا) یاخود شوێنی ئەو هاوەڵگەرانە دەکەون کە بەناوی دینەوە بەرنامەیان بۆ داناون و پەیڕەوییان دەکەن بێ ئەوەی خوا مۆڵەتی دابێت و پێی رازی بێت (حەرام و حەڵاڵیان بۆ دیاری دەکەن)، خۆ ئەگەر بڕیاری پێشترمان نەبوایە بە مانەوەیان تا کاتی دیاریکراو، ئەوە فەرمان دەدرا بە لەناو بردنیان، بێگومان بۆ ستەمکاران سزای بە ئێش و بەسۆ ئامادەیە.

(٢٢) (لە رۆژی قیامەت و لێپرسینەوەدا) دەبینیت ستەمکاران دەترسن لەوەی کە کردوویانە، لەکاتێکدا سزاکەی کەوتووە بەسەریاندا و لێی دەرباز نابن، هاوکات ئەوانەی کە باوەڕیان هێناوە و کارو کردەوە چاکەکانیان ئەنجامداوە لە باخچەکانی بەهەشتدا ژیانی کامەرانی دەبەنە سەر، چیان بوێت لەلایەن پەروەردگاریانەوە بۆیان ئامادەیە، ئا ئەوەیە خەڵات و بەخششی گەورە و بێسنوور.

ذَٰلِكَ ٱلَّذِي يُبَشِّرُ ٱللَّهُ عِبَادَهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ قُل لَّآ أَسْـَٔلُكُمْ عَلَيْهِ أَجْرًا إِلَّا ٱلْمَوَدَّةَ فِي ٱلْقُرْبَىٰ وَمَن يَقْتَرِفْ حَسَنَةً نَّزِدْ لَهُۥ فِيهَا حُسْنًا إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ شَكُورٌ ﴿٢٣﴾ أَمْ يَقُولُونَ ٱفْتَرَىٰ عَلَى ٱللَّهِ كَذِبًا فَإِن يَشَإِ ٱللَّهُ يَخْتِمْ عَلَىٰ قَلْبِكَ وَيَمْحُ ٱللَّهُ ٱلْبَٰطِلَ وَيُحِقُّ ٱلْحَقَّ بِكَلِمَٰتِهِۦٓ إِنَّهُۥ عَلِيمٌۢ بِذَاتِ ٱلصُّدُورِ ﴿٢٤﴾ وَهُوَ ٱلَّذِي يَقْبَلُ ٱلتَّوْبَةَ عَنْ عِبَادِهِۦ وَيَعْفُواْ عَنِ ٱلسَّيِّـَٔاتِ وَيَعْلَمُ مَا تَفْعَلُونَ ﴿٢٥﴾ وَيَسْتَجِيبُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ وَيَزِيدُهُم مِّن فَضْلِهِۦ وَٱلْكَٰفِرُونَ لَهُمْ عَذَابٌ شَدِيدٌ ﴿٢٦﴾ ۞ وَلَوْ بَسَطَ ٱللَّهُ ٱلرِّزْقَ لِعِبَادِهِۦ لَبَغَوْاْ فِي ٱلْأَرْضِ وَلَٰكِن يُنَزِّلُ بِقَدَرٍ مَّا يَشَآءُ إِنَّهُۥ بِعِبَادِهِۦ خَبِيرٌۢ بَصِيرٌ ﴿٢٧﴾ وَهُوَ ٱلَّذِي يُنَزِّلُ ٱلْغَيْثَ مِنۢ بَعْدِ مَا قَنَطُواْ وَيَنشُرُ رَحْمَتَهُۥ وَهُوَ ٱلْوَلِيُّ ٱلْحَمِيدُ ﴿٢٨﴾ وَمِنْ ءَايَٰتِهِۦ خَلْقُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَمَا بَثَّ فِيهِمَا مِن دَآبَّةٍ وَهُوَ عَلَىٰ جَمْعِهِمْ إِذَا يَشَآءُ قَدِيرٌ ﴿٢٩﴾ وَمَآ أَصَٰبَكُم مِّن مُّصِيبَةٍ فَبِمَا كَسَبَتْ أَيْدِيكُمْ وَيَعْفُواْ عَن كَثِيرٍ ﴿٣٠﴾ وَمَآ أَنتُم بِمُعْجِزِينَ فِي ٱلْأَرْضِ وَمَا لَكُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ مِن وَلِيٍّ وَلَا نَصِيرٍ ﴿٣١﴾



(٢٣) ئەو خەڵات و بەخششە ئەوەیە کە خوا مژدە دەدات بەو بەندانەی کە باوەڕیان هێناوە و کاروکردەوە چاکەکانیان ئەنجامداوە، (ئەوانەش بەدەم بانگەوازەوە نایەن)، ئەی پێغەمبەر ﷺ پێیان بڵێ: لەسەر ئەم بانگەوازە هیچ جۆرە پاداشتێکم لە ئێوە ناوێت، تەنها خۆشەویستی و ڕێز نەبێت لە خزمایەتیدا، جا ئەوەی چاکەیەک ئەنجام بدات، ئەوە بەچاکتر پاداشت دەدرێتەوە، چونکە بەڕاستی خوا لێبووردە و سوپاسگوزارە.

(٢٤) بەڵکو خوانەناسان دەڵێن: محمد ﷺ بەدەم خواوە درۆی هەڵبەستووە!! جا ئەگەر خوا بیەوێت مۆر دەنێت بەسەر دڵت داو هیچت بۆ ناوترێت، خوایش دەیەوێت ناسەواری بەتاڵ و ناحەقی نەهێڵێت و حەق و ڕاستی بەفەرمانی خۆی بچەسپێنێت، چونکە بەڕاستی ئەو خوایە زانایە بەوەی کە لە توێی دڵ و دەروون و سینەکاندا شاراوەیە.

(٢٥) خوا ئەو زاتەیە کە پەشیمانی و تەوبە لە بەندەکانی وەردەگرێت، چاوپۆشیش دەکات لە هەڵە و گوناهەکانیان، بەو کارو کردەوانەش کە ئەنجامی دەدەن دەزانێت و بە ئاگایە.

(٢٦) خوای گەورە ئاواتی ئەوانە دەهێنێتە دی کە باوەڕیان هێناوە و کارو کردەوە چاکەکانیان ئەنجامداوە، هەروەها لە فەزڵ و زیادە خەڵات و بەخششی خۆی بەهرەمەندیان دەکات، بێ باوەڕانیش سزای سەخت و بە ئێشیان بۆ ئامادەیە.

(٢٧) خۆ ئەگەر خوا رزق و ڕۆزی بەفراوانی بە بەندەکانی ببەخشیایە، ئەوە دەستیان دەدایە تاوان و گوناهو ستەم لە زەویدا، بەڵام خوا بەحسابێکی وردو دیاریکراو ئەوەی بیەوێت پێیان دەبەخشێت، بەڕاستی ئەو زاتە ئاگاو بینایە بە کارو هەڵوێستی بەندەکانی.

(٢٨) خوا ئەو زاتەیە کە باران دەبارێنێت و دەگەیەنێتە فریایان دوای ئەوەی کە نائومێد بوون، هەروەها ڕەحمەت و بەخششی خۆی پەخش دەکاتەوە، لەبەرئەوە هەر خۆی پشتیوان و فریادڕەسە و شایستەی سوپاسە.

(٢٩) لە نیشانە و بەڵگەکانی گەورەیی و دەسەڵاتی خوا: دروستکردنی ئاسمانەکان و زەوی و ئەو زیندەوەرانەیە کە تیایاندا بڵاوی کردۆتەوە، هەر ئەو زاتە کاتێک بیەوێت تواناو دەسەڵاتی بەسەر کۆکردنەوەیاندا هەیە .

(٣٠) هەر بەڵاو نەهامەتیەکتان بەسەر هاتبێت، ئەوە دەرەنجامی ئەو کارو کردەوانەیە کە بە ئارەزووی خۆتان دەتانکرد، (بەڵام ئەوەندە خوایەکی میهرەبانە) لە زۆربەی زۆری گوناهو هەڵەکانتان خۆش دەبێت.

(٣١) ئەی گرۆی خوانەناسان ئێوە ناتوانن خوا دەستەوسان بکەن و لە دەسەڵاتی خوا دەرباز ببن لە زەویدا، جگە لە خوای گەورەش کەس ناتوانێت پشتیوانتان بێت و سەرتان بخات.

وَمِنْ ءَايَٰتِهِ ٱلْجَوَارِ فِى ٱلْبَحْرِ كَٱلْأَعْلَٰمِ ﴿٣٢﴾ إِن يَشَأْ يُسْكِنِ ٱلرِّيحَ فَيَظْلَلْنَ رَوَاكِدَ عَلَىٰ ظَهْرِهِۦٓ ۚ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَٰتٍ لِّكُلِّ صَبَّارٍ شَكُورٍ ﴿٣٣﴾ أَوْ يُوبِقْهُنَّ بِمَا كَسَبُوا۟ وَيَعْفُ عَن كَثِيرٍ ﴿٣٤﴾ وَيَعْلَمَ ٱلَّذِينَ يُجَٰدِلُونَ فِىٓ ءَايَٰتِنَا مَا لَهُم مِّن مَّحِيصٍ ﴿٣٥﴾ فَمَآ أُوتِيتُم مِّن شَىْءٍ فَمَتَٰعُ ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا ۖ وَمَا عِندَ ٱللَّهِ خَيْرٌ وَأَبْقَىٰ لِلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَلَىٰ رَبِّهِمْ يَتَوَكَّلُونَ ﴿٣٦﴾ وَٱلَّذِينَ يَجْتَنِبُونَ كَبَٰٓئِرَ ٱلْإِثْمِ وَٱلْفَوَٰحِشَ وَإِذَا مَا غَضِبُوا۟ هُمْ يَغْفِرُونَ ﴿٣٧﴾ وَٱلَّذِينَ ٱسْتَجَابُوا۟ لِرَبِّهِمْ وَأَقَامُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ وَأَمْرُهُمْ شُورَىٰ بَيْنَهُمْ وَمِمَّا رَزَقْنَٰهُمْ يُنفِقُونَ ﴿٣٨﴾ وَٱلَّذِينَ إِذَآ أَصَابَهُمُ ٱلْبَغْىُ هُمْ يَنتَصِرُونَ ﴿٣٩﴾ وَجَزَٰٓؤُا۟ سَيِّئَةٍ سَيِّئَةٌ مِّثْلُهَا ۖ فَمَنْ عَفَا وَأَصْلَحَ فَأَجْرُهُۥ عَلَى ٱللَّهِ ۚ إِنَّهُۥ لَا يُحِبُّ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٤٠﴾ وَلَمَنِ ٱنتَصَرَ بَعْدَ ظُلْمِهِۦ فَأُو۟لَٰٓئِكَ مَا عَلَيْهِم مِّن سَبِيلٍ ﴿٤١﴾ إِنَّمَا ٱلسَّبِيلُ عَلَى ٱلَّذِينَ يَظْلِمُونَ ٱلنَّاسَ وَيَبْغُونَ فِى ٱلْأَرْضِ بِغَيْرِ ٱلْحَقِّ ۚ أُو۟لَٰٓئِكَ لَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿٤٢﴾ وَلَمَن صَبَرَ وَغَفَرَ إِنَّ ذَٰلِكَ لَمِنْ عَزْمِ ٱلْأُمُورِ ﴿٤٣﴾ وَمَن يُضْلِلِ ٱللَّهُ فَمَا لَهُۥ مِن وَلِىٍّ مِّنۢ بَعْدِهِۦ ۗ وَتَرَى ٱلظَّٰلِمِينَ لَمَّا رَأَوُا۟ ٱلْعَذَابَ يَقُولُونَ هَلْ إِلَىٰ مَرَدٍّ مِّن سَبِيلٍ ﴿٤٤﴾

(٣٢) لە نیشانە و بەڵگەی دەسەڵاتی خوا ئەو کەشتیانەیە کە وەک کەژو کێو هاتووچۆ دەکەن بە دەریاکاندا، (بەیاسایەکی رێک و پێک).

(٣٣) خۆ ئەگەر بیەوێت با دەوەستێنێت و لەسەر پشتی دەریاکە دەوەستن و لەکاردەکەون، بەڕاستی ئا لەو تواناو دەسەڵاتەدا بەڵگەو نیشانەی زۆر هەن بۆ هەر کەسێک کە زۆر خۆگرو سوپاسگوزارە.

(٣٤) یان جاری وا هەیە کەشتیەکان بە خۆیان و سەرنشینەکانیانەوە دەشکێنێت و نوقمیان دەکات لە ئەنجامی تاوان و گوناهی خەڵکەکەوە، گەلێک جاریش چاوپۆشی (لە هەڵە و تاوانی) زۆر دەکات و دەیانهێڵێتەوە.

(٣٥) ئەم روونکردنەوەیەش بۆ ئەوەیە خوانەناسان بزانن، بە تایبەت ئەوانەی کە موجادەلەو دەمەدەمێ دەکەن و رەخنەیان لە ئایەتەکانی ئێمە هەیە، کە لەکاتی تەنگانەدا کەس پەنایان نادات و کەس فریایان ناکەوێت جگە لە خوای گەورە.

(٣٦) جا هەر شتێکتان پێبەخشراوە، ئەوە زینەتی ژیانی ئەم دنیایەیە (کە رێگوزەرێکە بەرەو قیامەت) بەڵام ئەو بەشەی کە لەلای خوایە چاکتر و بەردەوامترە بۆ ئەوانەی کە باوەڕیان هێناوە و هەر پشت بە پەروەردگاریان دەبەستن...

(٣٧) ئەوانەی خۆیان لە گوناهی گەورە و تاوانی خراپ و ناشیرین دەپارێزن، کاتێک کە تووڕە دەبن (لەسەر هەڵەیەک کە بەرامبەریان دەکرێت) هەر ئەمان چاوپۆشی دەکەن و لێدەبورن...

(٣٨) ئەوانەش بەدەم بانگەوازی پەروەردگاریانەوە چوون و نوێژەکانیان بەچاکی ئەنجام داوە و کارو باریان هەردەم بە مەشورەت و راپرسی و راوێژکاریە و لەو رزق و رۆزیەی کە پێمان داون، دەبەخشن...

(٣٩) هەروەها ئەوانەی کە دەستدرێژیان کرایەسەر، دەسەوسان ناوەستن و بەرگری لە خۆیان دەکەن...

(٤٠) جا تۆڵەی هەر تاوانێک بە ئەندازەی تاوانەکەیە بێ زیادو کەم، ئەو کەسەی لێخۆشبوونی هەبێت و چاوپۆشی و چاکسازی بکات؛ ئەوە پاداشتی لای خوایە، بەڕاستی خوا ستەمکارانی خۆش ناوێت...

(٤١) لەڕاستیدا ئەوەی حەقی خۆی دەسێنێت دوای ئەوەی کە ستەمی لێکراوە، ئەوانە لێپرسراو نابن، ئەگەر لە سنوور لانەدەن...

(٤٢) بێگومان تەنها ئەوانە بەرپرس دەبن کە ستەم لە خەڵکی دەکەن و دەستدرێژی دەکەن بە ناحەق لە زەویدا، ئا ئەوانە سزاو ئازاری بە ئێشیان بۆ هەیە...

(٤٣) لەڕاستیدا ئەوەی دان بەخۆیدا بگرێت و چاوپۆشی بکات و لێخۆشبوو بێت (لەکاتێکدا کە دەتوانێت تۆڵەبسێنێت) بەڕاستی ئەوە کارێکی بەجێ و چاک و پەسەند ئەنجام دەدات، بەڕاستی ئەوە لەو کارانەیە کە پێویستە بکرێت...

(٤٤) ئەوەی خوا رێی لێ ون بکات، ئەوە ئیتر کەسی تری دڵسۆزی دەست ناکەوێت (تا رێگەی راستی نیشان بدات)، ئەوسا تۆ ئەی محمد ﷺ لە قیامەتدا دەبینیت ستەمکاران کاتێک سزاو ئەشکەنجەی دۆزەخ دەبینن، بە کەساسیەوە دەڵێن: ئایا هیچ رێگەیەک هەیە بۆ گەڕانەوە، تا خوا چۆن دەفەرموێت وا بکەین؟!.

وَتَرَىٰهُمْ يُعْرَضُونَ عَلَيْهَا خَٰشِعِينَ مِنَ ٱلذُّلِّ يَنظُرُونَ مِن طَرْفٍ خَفِيٍّ ۗ وَقَالَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ إِنَّ ٱلْخَٰسِرِينَ ٱلَّذِينَ خَسِرُوٓا۟ أَنفُسَهُمْ وَأَهْلِيهِمْ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ ۗ أَلَآ إِنَّ ٱلظَّٰلِمِينَ فِى عَذَابٍ مُّقِيمٍ ﴿٤٥﴾ وَمَا كَانَ لَهُم مِّنْ أَوْلِيَآءَ يَنصُرُونَهُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ ۗ وَمَن يُضْلِلِ ٱللَّهُ فَمَا لَهُۥ مِن سَبِيلٍ ﴿٤٦﴾ ٱسْتَجِيبُوا۟ لِرَبِّكُم مِّن قَبْلِ أَن يَأْتِىَ يَوْمٌ لَّا مَرَدَّ لَهُۥ مِنَ ٱللَّهِ ۚ مَا لَكُم مِّن مَّلْجَإٍ يَوْمَئِذٍ وَمَا لَكُم مِّن نَّكِيرٍ ﴿٤٧﴾ فَإِنْ أَعْرَضُوا۟ فَمَآ أَرْسَلْنَٰكَ عَلَيْهِمْ حَفِيظًا ۖ إِنْ عَلَيْكَ إِلَّا ٱلْبَلَٰغُ ۗ وَإِنَّآ إِذَآ أَذَقْنَا ٱلْإِنسَٰنَ مِنَّا رَحْمَةً فَرِحَ بِهَا ۖ وَإِن تُصِبْهُمْ سَيِّئَةٌۢ بِمَا قَدَّمَتْ أَيْدِيهِمْ فَإِنَّ ٱلْإِنسَٰنَ كَفُورٌ ﴿٤٨﴾ لِّلَّهِ مُلْكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۚ يَخْلُقُ مَا يَشَآءُ ۚ يَهَبُ لِمَن يَشَآءُ إِنَٰثًا وَيَهَبُ لِمَن يَشَآءُ ٱلذُّكُورَ ﴿٤٩﴾ أَوْ يُزَوِّجُهُمْ ذُكْرَانًا وَإِنَٰثًا ۖ وَيَجْعَلُ مَن يَشَآءُ عَقِيمًا ۚ إِنَّهُۥ عَلِيمٌ قَدِيرٌ ﴿٥٠﴾ ۞ وَمَا كَانَ لِبَشَرٍ أَن يُكَلِّمَهُ ٱللَّهُ إِلَّا وَحْيًا أَوْ مِن وَرَآئِ حِجَابٍ أَوْ يُرْسِلَ رَسُولًا فَيُوحِىَ بِإِذْنِهِۦ مَا يَشَآءُ ۚ إِنَّهُۥ عَلِىٌّ حَكِيمٌ ﴿٥١﴾



(٤٥) سەرئەنجام تاوانباران دەبینیت دەبرێنە سەر دۆزەخ، هەموو پەست و زەلیل ولارە مل و خەجاڵەتن، (لە شەرمەزاریی و لە ترسدا) لە ژێرەوە بەتیلەی چاو دەڕوانن بۆ ئاگرەکە، (ئا لەو کات و بارودۆخە ناخۆشەدا) ئەوانەی باوەڕیان هێناوە دەڵێن: بەراستی خەسارەتمەند و زەرەرمەندان ئەمڕۆ ئەوانەن کە خۆیان و کەسوکارو ماڵ و منداڵیان لە دەستداوە لە قیامەتدا (کەس و کارو خزم و هاوەڵانیان ئەگەر لە دۆزەخدان، ئەوە هیچ مایەی دڵخۆشی نین، خۆ ئەگەر لە بەهەشتدان، ئەمانیان هەر لە یاد نییە)، ئینجا رادەگەیەنرێت کە: ئاگاداربن بێگومان ستەمکاران لە ئازارو ئەشکەنجەی بەردەوامدان...

(٤٦) ئەوانە هیچ دۆست و پشتیوانێکیان نییە لە جیاتی خوا کە لە دەست سزاو تۆڵە رزگاریان بکات، ئەو کەسەش خوا سەری لێ بشێوێنێت و گومڕای بکات (چونکە خۆی شایستە کردووە) ئیتر رێبازی رزگاری و سەرفرازی دەستناکەوێت.

(٤٧) خەڵکینە؛ بە پیر بانگەوازی پەروەردگارتانەوە بچن پێش ئەوەی رۆژێک بێت: هیچ گەڕانەوەی لەلایەن خواوە نابێت، ئەو رۆژە هیچ پەناگایەکتان نابێت و کەسیشتان ناتوانێت ئینکاری بکات و دان بە تاوانەکانیدا نەنێت.

(٤٨) ئەگەر خوانەناسان پشتیان هەڵکرد و گوێیان نەگرت، ئەی محمد ﷺ داخیان بۆ مەخۆ، چونکە ئێمە تۆمان نەناردووە چاودێر بیت بەسەریانەوە، بەڵکو تۆ تەنها گەیاندنی ئەم بانگەواز و قورئانەت لەسەرە، ئاشکراشە کە: بەراستی ئێمە کاتێک نازو نیعمەت و رەحمەتێک دەڕێژین بەسەر ئادەمیزادا زۆر کەشخەی پێوە دەکات، خۆ ئەگەر بەڵاو ناخۆشیەکیان تووش بێت، بەهۆی کاروکردەوە خراپەکانیانەوە، بەراستی ئەوکەسە زۆرسپڵە و رەخنە لە خوا گرە.

(٤٩) هەر بۆ خوایە خاوەنداریەتی ئاسمانەکان و زەوی، هەرچی بوێت دروستی دەکات، بە هەرکەس کە بیەوێت تەنها کچ دەبەخشێت و بە هەرکەس کە بیەوێت کوڕ دەبەخشێت...

(٥٠) یاخود لە هەردوو جۆر؛ بەهەندێک خێزان دەبەخشێت لە کوڕو لە کچ ؛ هەیشە ویستی خوا وایە هیچی نەدانێ و نەزۆک بێت، بەڕاستی ئەو زاتە زانا و بەدەسەڵاتە.

(٥١) کەس بۆی نیە هیچ کات (لە دنیادا) خوای گەورە وتو وێژی راستەوخۆی لەگەڵدا بکات مەگەر لە رێگەی وەحی و نیگاوە، یان لە پشتی پەردەوە، وەک موسا، یان نێردراوێکی وەک فریشتە ـ جوبرەئیل ـ دەنێرێت کە بە گوێرەی فەرمان و مۆڵەتی خوا چی پێ سپێردراوە دەیگەیەنێت، بەڕاستی ئەو زاتە خوایەکی بڵند و داناو کاربەجێیە.

وَكَذَٰلِكَ أَوْحَيْنَآ إِلَيْكَ رُوحًا مِّنْ أَمْرِنَا ۚ مَا كُنتَ تَدْرِى مَا ٱلْكِتَٰبُ وَلَا ٱلْإِيمَٰنُ وَلَٰكِن جَعَلْنَٰهُ نُورًا نَّهْدِى بِهِۦ مَن نَّشَآءُ مِنْ عِبَادِنَا ۚ وَإِنَّكَ لَتَهْدِىٓ إِلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ ﴿٥٢﴾ صِرَٰطِ ٱللَّهِ ٱلَّذِى لَهُۥ مَا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِى ٱلْأَرْضِ ۗ أَلَآ إِلَى ٱللَّهِ تَصِيرُ ٱلْأُمُورُ ﴿٥٣﴾

## سُورَةُ الزُّخْرُفِ

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

حمٓ ﴿١﴾ وَٱلْكِتَٰبِ ٱلْمُبِينِ ﴿٢﴾ إِنَّا جَعَلْنَٰهُ قُرْءَٰنًا عَرَبِيًّا لَّعَلَّكُمْ تَعْقِلُونَ ﴿٣﴾ وَإِنَّهُۥ فِىٓ أُمِّ ٱلْكِتَٰبِ لَدَيْنَا لَعَلِىٌّ حَكِيمٌ ﴿٤﴾ أَفَنَضْرِبُ عَنكُمُ ٱلذِّكْرَ صَفْحًا أَن كُنتُمْ قَوْمًا مُّسْرِفِينَ ﴿٥﴾ وَكَمْ أَرْسَلْنَا مِن نَّبِىٍّ فِى ٱلْأَوَّلِينَ ﴿٦﴾ وَمَا يَأْتِيهِم مِّن نَّبِىٍّ إِلَّا كَانُوا۟ بِهِۦ يَسْتَهْزِءُونَ ﴿٧﴾ فَأَهْلَكْنَآ أَشَدَّ مِنْهُم بَطْشًا وَمَضَىٰ مَثَلُ ٱلْأَوَّلِينَ ﴿٨﴾ وَلَئِن سَأَلْتَهُم مَّنْ خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ لَيَقُولُنَّ خَلَقَهُنَّ ٱلْعَزِيزُ ٱلْعَلِيمُ ﴿٩﴾ ٱلَّذِى جَعَلَ لَكُمُ ٱلْأَرْضَ مَهْدًا وَجَعَلَ لَكُمْ فِيهَا سُبُلًا لَّعَلَّكُمْ تَهْتَدُونَ ﴿١٠﴾

(٥٢) ئەی محمد ﷺ تا بەو شێوەیەی کە وتمان ئێمە قورئانمان بۆ رەوانە کردیت لە لایەن خۆمانەوە (کە ژیانبەخشە بە رۆح و گیان و عەقل)، تۆ نەتدەزانی قورئان چیە و ئیمان چیە، بەڵام ئێمە ئەم قورئانەمان کردە روناکی ونورێك کە هیدایەت و رێنمویی هەرکەس کە بمانەوێت لە بەندەکانمانی پێ دەکەین، (ئەوانەی دڵی بۆ دەکەنەوە و بەچاکی گوێی بۆ دەگرن)، بێگومان تۆ ئەی پێغەمبەر ﷺ رێنیشان دەریت و رێنموی دەکەی بۆ رێگە و رێبازێکی راست و دروست...

(٥٣) کە رێگە و رێبازی ئەو خوایەیە، کە هەر بۆ ئەوە ئەوەی لە ئاسمانەکان و زەویدایە، ئاگاداریش بن: هەموو شتێك و سەرئەنجامی هەموو کارێك بۆ لای خوا دەگەرێتەوە.

سوورەتی (الزخـــرف)

بەناوی خوای بەخشندە و میهرەبان

(١) سەرنجی سەرەتای سورەتی (الشوری) بدە لاپەرە ـ ٤٨٣ ـ .

(٢) سوێند بەم پەیامە روون و ئاشکرایە، مەبەست قورئانە.

(٣) ئێمە ئەو کتێبەمان کردووە بە قورئانێك، بە زمانی عەرەبی، بەڵکو ژیری و بیروهۆشتان بخەنە کار (تا لێی تێبگەن و پەیرەوی بکەن).

(٤) ئەم قورئانە لە ـ لوح المحفوظ ـ دا (کە سەرچاوەی قورئان و هەموو کتێبەکانی تری خوایە) پارێزراوە کە زۆر بەرزو بەرێزە لامان و پرە لە دانایی.

(٥) باشە، ئایا دەکرێت ئێمە وازتان لێ بهێنین و هوشیارتان نەکەینەوە بەم قورئانە لەبەر ئەوەی ئێوە هۆزێکی زیادەڕە و و لارو وێرن (نەخێر شتی وا لە ئێمە ناوەشێتەوە).

(٦) ئێمە چەندەها پێغەمبەرمان ناردووە بۆ نەوەکانی رابووردوو تا سەرگەردان نەبن.

(٧) بێگومان هیچ پێغەمبەرێکیان بۆ نەهاتووە کە ئەوان گاڵتەیان پێ نەکردبێت .

(٨) کەواتە ئەبێ ئەم بێ بڕوایانە چاوەڕێی چی بکەن لە کاتێکدا ئێمە درندەتر و بە هەڵمەتترمان لەوان لەناو بردووە، ئیتر بەسەرهات و رووداوی پێشینان بەسەرچووە و تێپەڕیووە.

(٩) خۆ ئەگەر پرسیاریان لێ بکەیت: کێ ئاسمانەکان و زەوی دروست کردووە؟ لە وەڵامدا بەدڵنیاییی دەڵێن: هەر زاتی باڵادەست و زانا دروستی کردوون.

(١٠) ئەو خوایەی کە زەوی کردووە بە لانکەی ژیانتان، رێگەوبانی تیایدا بۆ ئاسان کردوون، بۆ ئەوەی بگەنە مەبەست و ژیانتان ئاسان و ئاسوودە بکەن.

وَٱلَّذِي نَزَّلَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءَۢ بِقَدَرٍ فَأَنشَرْنَا بِهِۦ بَلْدَةً مَّيْتًا ۚ كَذَٰلِكَ تُخْرَجُونَ ﴿١١﴾ وَٱلَّذِي خَلَقَ ٱلْأَزْوَٰجَ كُلَّهَا وَجَعَلَ لَكُم مِّنَ ٱلْفُلْكِ وَٱلْأَنْعَٰمِ مَا تَرْكَبُونَ ﴿١٢﴾ لِتَسْتَوُۥا عَلَىٰ ظُهُورِهِۦ ثُمَّ تَذْكُرُوا۟ نِعْمَةَ رَبِّكُمْ إِذَا ٱسْتَوَيْتُمْ عَلَيْهِ وَتَقُولُوا۟ سُبْحَٰنَ ٱلَّذِي سَخَّرَ لَنَا هَٰذَا وَمَا كُنَّا لَهُۥ مُقْرِنِينَ ﴿١٣﴾ وَإِنَّآ إِلَىٰ رَبِّنَا لَمُنقَلِبُونَ ﴿١٤﴾ وَجَعَلُوا۟ لَهُۥ مِنْ عِبَادِهِۦ جُزْءًا ۚ إِنَّ ٱلْإِنسَٰنَ لَكَفُورٌ مُّبِينٌ ﴿١٥﴾ أَمِ ٱتَّخَذَ مِمَّا يَخْلُقُ بَنَاتٍ وَأَصْفَىٰكُم بِٱلْبَنِينَ ﴿١٦﴾ وَإِذَا بُشِّرَ أَحَدُهُم بِمَا ضَرَبَ لِلرَّحْمَٰنِ مَثَلًا ظَلَّ وَجْهُهُۥ مُسْوَدًّا وَهُوَ كَظِيمٌ ﴿١٧﴾ أَوَمَن يُنَشَّؤُا۟ فِي ٱلْحِلْيَةِ وَهُوَ فِي ٱلْخِصَامِ غَيْرُ مُبِينٍ ﴿١٨﴾ وَجَعَلُوا۟ ٱلْمَلَٰٓئِكَةَ ٱلَّذِينَ هُمْ عِبَٰدُ ٱلرَّحْمَٰنِ إِنَٰثًا ۚ أَشَهِدُوا۟ خَلْقَهُمْ ۚ سَتُكْتَبُ شَهَٰدَتُهُمْ وَيُسْـَٔلُونَ ﴿١٩﴾ وَقَالُوا۟ لَوْ شَآءَ ٱلرَّحْمَٰنُ مَا عَبَدْنَٰهُم ۗ مَّا لَهُم بِذَٰلِكَ مِنْ عِلْمٍ ۖ إِنْ هُمْ إِلَّا يَخْرُصُونَ ﴿٢٠﴾ أَمْ ءَاتَيْنَٰهُمْ كِتَٰبًا مِّن قَبْلِهِۦ فَهُم بِهِۦ مُسْتَمْسِكُونَ ﴿٢١﴾ بَلْ قَالُوٓا۟ إِنَّا وَجَدْنَآ ءَابَآءَنَا عَلَىٰٓ أُمَّةٍ وَإِنَّا عَلَىٰٓ ءَاثَٰرِهِم مُّهْتَدُونَ ﴿٢٢﴾

(١١) هەروەها ئەو خوایە لە ئاسمانەوە بە ئەندازەیەکی دیاریی کراو بارانی باراندووە و دەفەرموێت، ولاتی وشک و مردوومان پێی زیندوو کردۆتەوە، هەر بەو شێوەیە ئێوەش لە گۆڕەکانتان دەهێنرێنە دەرەوە.

(١٢) هەر ئەو زاتە هەموو جووتەکانی (لەجیهانی نادەمیزاد و زیندەوەران و ڕوەک و بێ گیانەکاندا) دروست کردووە، هەروەها کەشتی و جۆرەکانی ئاژەڵی بۆ رام هێناون، کە بۆ سواریی سوودی لێ وەربگرن.

(١٣) بۆ ئەوەی لەسەر پشتیان جێگیر ببن، دوایش یادی نازو نیعمەتی پەروەردگارتان بکەنەوە کاتێک کە سەقامگیر دەبن لەسەری،(چونکە جۆرەها هۆکاری هاتووچۆی بۆ سازاندوون) و بڵێن: ستایش و بەرزی و بێگەردی بۆ ئەو زاتەی کە ئەمەی بۆ ڕەخساندوین (خۆ ئەگەر ئەو بەمیهرەبانی خۆی بۆی رام نەکردینایە) ئێمە نەماندەتوانی رامیان بهێنین.

(١٤) ئێمە بێگومان هەر بۆ لای پەروەردگارمان دەگەڕێینەوە.

پێغەمبەرﷺ هەر جارێک سواری ولاخەکەی ببوایە سێ جار (الله اکبر)ی دەفەرموو، دوایی دەیفەرموو: سبحان الذي سخر لنا هذا وما كنا له مقرنين وإنا إلى ربنا لمنقلبون).

(١٥) باوەڕ چەوتەکان، هەندێ لە بەندەکانی خوا، بە خوا دەزانن (مەسیحییەکان دەڵێن: عیسا کوڕی خوایە، جوو دەڵێت: عوزەیر، بتپەرستەکان دەڵێن: فریشتەکان کچیخوان)!! بەڕاستی زۆربەی خەڵکی قەدری خوا نازانن و بێ باوەڕێکی زۆر ئاشکران.

(١٦) ئایا ڕەواو راستە، لەوەی کە دروستی دەکات کچان بۆ خۆی بڕیار بدات و بەخشینی کوڕانیش بەرەوا بزانێت بۆ ئێوە؟! (ئەمانە هەمووی بیروباوەڕی نەفامەکان بوون خوای گەورە دەیەوێت هەر بە بۆچوونی خۆیان بیروباوەڕیان پووچەڵ بکاتەوە).

(١٧) کاتێکیش مژدە بدرێت بە یەکێکیان بەوەی کە بۆ خوای میهرەبان بە ڕەوای زانیوە (مەبەست ئەوەیە کە کچیان بووە)، ئەوە رووخساری ڕەش هەڵدەگەڕێت و لە دەروونەدا پیش دەخواتەوە.

(١٨) ئایا کەسێک بەمنداڵی خوا ڕەوا دەبینن، (کە لەباوی ئەواندا) هەردەم پەروەردە دەکرێت لەناو خشڵ و ئارایش کردنی خۆیداو لە شەڕو شۆڕو جەنگیشدا دەرناکەوێت؟!

(١٩) ئەو خوانەناسانە فریشتەکان کە بەندەی خوای میهرەبانن، بەکچی خوایان دەدایە قەڵەم!! ئایا ئەوان ئامادەی دروستکردنیان بوون؟! لە ئایندەدا ئەم بوختانەیان لەسەر دەنوسرێت و پرسیاریشیان لێ دەکرێت.

(٢٠) (بۆ پینە کردنی هەڵوێستی نارەوایان) دەیانوت: ئەگەر خوای میهرەبان بیویستایە.. ئێمە ئەمانەمان نەدەپەرست، وە نەبێت لەسەر بنچینەی هیچ زانستی و زانیاریەک ئەو قسەیە بکەن، ئەمانە تەنها درۆ نەبێت هیچی تر ناڵێن.

(٢١) ئایا ئەو خوانەناسانە پێش ئەم قورئانە کتێبێکی ترمان بۆ ناردوون؟ تا پابەندی بن و پەیڕەوی بکەن ؟

(٢٢) ئەوانە هیچی وا نیە، بەڵکو هەر تەنها ئەوەیە کە دەیانوت: بەڕاستی ئێمە باوو باپیرانی خۆمان لەسەر ئاین و بەرنامەیەکی ناوا دیوە، بێگومان ئێمەش بەشوێن ڕێبازی ئەواندا هەنگاو هەڵدەگرین و ڕێنموییمان وەرگرتووە!!

وَكَذَٰلِكَ مَآ أَرْسَلْنَا مِن قَبْلِكَ فِى قَرْيَةٍ مِّن نَّذِيرٍ إِلَّا قَالَ مُتْرَفُوهَآ إِنَّا وَجَدْنَآ ءَابَآءَنَا عَلَىٰٓ أُمَّةٍ وَإِنَّا عَلَىٰٓ ءَاثَٰرِهِم مُّقْتَدُونَ ﴿٢٣﴾ ۞ قَٰلَ أَوَلَوْ جِئْتُكُم بِأَهْدَىٰ مِمَّا وَجَدتُّمْ عَلَيْهِ ءَابَآءَكُمْ قَالُوٓا۟ إِنَّا بِمَآ أُرْسِلْتُم بِهِۦ كَٰفِرُونَ ﴿٢٤﴾ فَٱنتَقَمْنَا مِنْهُمْ فَٱنظُرْ كَيْفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلْمُكَذِّبِينَ ﴿٢٥﴾ وَإِذْ قَالَ إِبْرَٰهِيمُ لِأَبِيهِ وَقَوْمِهِۦٓ إِنَّنِى بَرَآءٌ مِّمَّا تَعْبُدُونَ ﴿٢٦﴾ إِلَّا ٱلَّذِى فَطَرَنِى فَإِنَّهُۥ سَيَهْدِينِ ﴿٢٧﴾ وَجَعَلَهَا كَلِمَةًۢ بَاقِيَةً فِى عَقِبِهِۦ لَعَلَّهُمْ يَرْجِعُونَ ﴿٢٨﴾ بَلْ مَتَّعْتُ هَٰٓؤُلَآءِ وَءَابَآءَهُمْ حَتَّىٰ جَآءَهُمُ ٱلْحَقُّ وَرَسُولٌ مُّبِينٌ ﴿٢٩﴾ وَلَمَّا جَآءَهُمُ ٱلْحَقُّ قَالُوا۟ هَٰذَا سِحْرٌ وَإِنَّا بِهِۦ كَٰفِرُونَ ﴿٣٠﴾ وَقَالُوا۟ لَوْلَا نُزِّلَ هَٰذَا ٱلْقُرْءَانُ عَلَىٰ رَجُلٍ مِّنَ ٱلْقَرْيَتَيْنِ عَظِيمٍ ﴿٣١﴾ أَهُمْ يَقْسِمُونَ رَحْمَتَ رَبِّكَ ۚ نَحْنُ قَسَمْنَا بَيْنَهُم مَّعِيشَتَهُمْ فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا ۚ وَرَفَعْنَا بَعْضَهُمْ فَوْقَ بَعْضٍ دَرَجَٰتٍ لِّيَتَّخِذَ بَعْضُهُم بَعْضًا سُخْرِيًّا ۗ وَرَحْمَتُ رَبِّكَ خَيْرٌ مِّمَّا يَجْمَعُونَ ﴿٣٢﴾ وَلَوْلَآ أَن يَكُونَ ٱلنَّاسُ أُمَّةً وَٰحِدَةً لَّجَعَلْنَا لِمَن يَكْفُرُ بِٱلرَّحْمَٰنِ لِبُيُوتِهِمْ سُقُفًا مِّن فِضَّةٍ وَمَعَارِجَ عَلَيْهَا يَظْهَرُونَ ﴿٣٣﴾




(٢٣) هەر بەو شێوەیە هیچ پێغەمبەرێکمان نەناردووە بۆ هیچ شارێک، کە خۆشگوزەرانەکان نەیانوتبێت: ئێمە باوو باپیرانی خۆمان بینیووە پابەندی بیروباوەڕێک بوون، بێگومان ئێمەش چاو لەوان دەکەین و پەیڕەوی ئەوان دەکەین.

(٢٤) پێغەمبەرەکەش وتوویەتی: باشە.. ئەگەر لە ڕێگە و ڕێبازو بەرنامەی باو و باپیرانتان چاکتریشم بۆ هێنان هەر شوێنیان دەکەون؟! لە وەڵامدا وتیان: بەراستی ئێمە بەو بەرنامە و پەیامەی کە بە ئێوەدا ڕەوانە کراوە بڕوا ناکەین.

(٢٥) جا ئێمەش تۆڵەمان لێسەندن، سەرنج بدە و ببینە سەرئەنجامی ئەوانەی بڕوایان بە پەیامی پێغەمبەران نەکرد چۆن بوو.

(٢٦) ئەو کاتە بهێنەوە یاد کە ئیبراهیم بە باوکی و هۆزەکەی خۆی ووت: بەراستی من دوورە پەرێزم لەو شتانەی کە ئێوە دەیپەرستن...

(٢٧) جگە لەو زاتەی کە دروستی کردووم، هەر ئەویش ڕێنموویم دەکات و دەمخاتە سەر ڕێگەی ڕاست و دروست.

(٢٨) ئەوسا ئیتر ئەو بەرنامەی یەکخواناسیەی هێشتەوە بۆ هۆزو گەلانی دوای خۆی، بۆ ئەوەی ئەوانیش بگەڕێنەوە بۆ سەر ئەو بیروباوەڕە ڕاستە.

(٢٩) خوا دەفەرمووێت: جا من ئەوانە و باو و باپیرانیانم لە خۆشگوزەرانیدا هێشتەوە تا ئەو کاتەی قورئان و پێغەمبەرێکی ئاشکرایان بۆ هات (تا پەیامی خوایان بۆ ڕوون بکاتەوە).

(٣٠) کاتێکیش کە حەق و ڕاستیان پێگەیشت.. وتیان: ئەمە سیحرو جادووە و بێگومان ئێمە بێباوەڕین پێی..

(٣١) هەروەها بیانوویان گرت و وتیان: ئەوە بۆ ئەم قورئانە دانەبەزێنرا بۆ سەر پیاوێکی گەورە لە پیاوە گەورەکانی دوو شارەکە؟! (مەبەستیان مەککە و طائف بووە)

(٣٢) ئایا ئەوانە ڕەحمەتی پەروەردگاری تۆ دابەش دەکەن؟! (کەسانی شایستە دەدۆزنەوە بۆ پێغەمبەرایەتی؟!) لە کاتێکدا ئێمەین کە ڕزق و ڕۆزیمان لە نێوانیاندا دابەش کردووە لە ژیانی دنیادا و پلەو پایەی هەندێکمان بەرزکردۆتەوە بەسەر هەندێکیاندا، بۆ ئەوەی هەمووان کاروباری یەکتر تەواوبکەن وکەڵک لە توانایی ولێهاتوویی یەکتر وەربگرن، جا لەگەڵ ئەو هەموو بەهرە و بەخششانەدا ڕەحمەت و میهرەبانی پەروەردگاری تۆ (کە تایبەتی ئیماندارانە لە قیامەتدا) لە هەموو ئەو شتانەی کە خەڵکی کۆی دەکەنەوە (لە ماڵ و سامان و هۆکارەکانی ڕابواردن) چاکترو بەنرخترە.

(٣٣) ئەگەر لەبەرئەوە نەبوایە خەڵکی هەموو دەبوون بە یەکپارچە (لە بێ باوەڕی و تاوانکاریدا)، ئەوە هەر کەس باوەڕی بەخوای میهرەبان نەبوایە سەقفی خانووەکەیمان لە زیو بۆ دروست دەکرد، هەروەها قادرمە و ئاسانسۆرمان بۆ دەکردن تا بەسەریدا سەربکەون و دەربکەون...

وَلِبُيُوتِهِمْ أَبْوَٰبًا وَسُرُرًا عَلَيْهَا يَتَّكِـُٔونَ ﴿٣٤﴾ وَزُخْرُفًا ۚ وَإِن كُلُّ ذَٰلِكَ لَمَّا مَتَٰعُ ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا ۚ وَٱلْـَٔاخِرَةُ عِندَ رَبِّكَ لِلْمُتَّقِينَ ﴿٣٥﴾ وَمَن يَعْشُ عَن ذِكْرِ ٱلرَّحْمَٰنِ نُقَيِّضْ لَهُۥ شَيْطَٰنًا فَهُوَ لَهُۥ قَرِينٌ ﴿٣٦﴾ وَإِنَّهُمْ لَيَصُدُّونَهُمْ عَنِ ٱلسَّبِيلِ وَيَحْسَبُونَ أَنَّهُم مُّهْتَدُونَ ﴿٣٧﴾ حَتَّىٰٓ إِذَا جَآءَنَا قَالَ يَٰلَيْتَ بَيْنِى وَبَيْنَكَ بُعْدَ ٱلْمَشْرِقَيْنِ فَبِئْسَ ٱلْقَرِينُ ﴿٣٨﴾ وَلَن يَنفَعَكُمُ ٱلْيَوْمَ إِذ ظَّلَمْتُمْ أَنَّكُمْ فِى ٱلْعَذَابِ مُشْتَرِكُونَ ﴿٣٩﴾ أَفَأَنتَ تُسْمِعُ ٱلصُّمَّ أَوْ تَهْدِى ٱلْعُمْىَ وَمَن كَانَ فِى ضَلَٰلٍ مُّبِينٍ ﴿٤٠﴾ فَإِمَّا نَذْهَبَنَّ بِكَ فَإِنَّا مِنْهُم مُّنتَقِمُونَ ﴿٤١﴾ أَوْ نُرِيَنَّكَ ٱلَّذِى وَعَدْنَٰهُمْ فَإِنَّا عَلَيْهِم مُّقْتَدِرُونَ ﴿٤٢﴾ فَٱسْتَمْسِكْ بِٱلَّذِىٓ أُوحِىَ إِلَيْكَ ۖ إِنَّكَ عَلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ ﴿٤٣﴾ وَإِنَّهُۥ لَذِكْرٌ لَّكَ وَلِقَوْمِكَ ۖ وَسَوْفَ تُسْـَٔلُونَ ﴿٤٤﴾ وَسْـَٔلْ مَنْ أَرْسَلْنَا مِن قَبْلِكَ مِن رُّسُلِنَآ أَجَعَلْنَا مِن دُونِ ٱلرَّحْمَٰنِ ءَالِهَةً يُعْبَدُونَ ﴿٤٥﴾ وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا مُوسَىٰ بِـَٔايَٰتِنَآ إِلَىٰ فِرْعَوْنَ وَمَلَإِي۟هِۦ فَقَالَ إِنِّى رَسُولُ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٤٦﴾ فَلَمَّا جَآءَهُم بِـَٔايَٰتِنَآ إِذَا هُم مِّنْهَا يَضْحَكُونَ ﴿٤٧﴾

(٣٤) هەروەها بۆ ماڵەکانیان قاپی و دەروازەی زیو و کورسی و قەنەفەی رازاوەشمان پێدەبەخشین تا پاڵ بدەنەوە و شانی لەسەر دادەن...

(٣٥) بە هەموو جۆرە نەخش و نیگارێکی جوان و رازاوە (دارو دیوارو سەقف ودەرگا و کەلوپەلی ناو ماڵەکانیانمان دەڕازاندەوە)، جا ئەوە هەر هەمووی خۆشگوزەرانی ژیانی دنیا نەبێت هیچی تر نییە، لە کاتێکدا کە ژیانی پڕ لە خۆشی و بەختەوەری نەبڕاوە لای پەروەردگارت بۆ خواناسان و دوورە پەرێزانە لە گوناه .

(٣٦) کەسێک خۆی کوێر بکات لە ئاستی قورئان و یادی خوای میهرەبان، ئەوە ئێمە شەیتانێک دەکەینە ملۆزمی وهەمیشە دەبێتە یار و یاوەری و لەگەڵیدا دەبێت.

(٣٧) بێگومان ئەو شەیتانانە؛ ڕێگەی راستیان لێ دەگرن و وایان لێدەکەن کە وابزانن بەدڵنیایی لەسەر ڕێبازێکی چاک و راستن.

(٣٨) تا ئەو کاتەی خەڵەتاوەکە دێتە لامان (لە قیامەتدا خۆی و شەیتانەکەی ئامادە دەکرێن بۆ لێپرسینەوە) ئەوە بە شەیتانەکەی دەڵێت: خۆزگە نێوانی من و تۆ بە قەدەر رۆژهەڵات و رۆژئاوا لەیەک دوور بوایە، ئای کە هاوڕێیەکی نالەبارو خراپ بوویت.

(٣٩) ئەمڕۆ ئەو قسە و گلەیی و بناشتانە هەرگیز سوودتان پێ ناگەیەنن، (چونکە) کاتی خۆی ئێوە ستەمتان لە خۆتان و خەڵکیش کردووە، ئێستە بێگومان هەردوولاتان لە سزاو ئازاردا بەشدارن .

(٤٠) ئایا تۆ ئەی پێغەمبەر ئەو بێ باوەڕەی کە وەک کەڕ وایە گوێبیست دەکەیت؟ یان ئەوەی کوێرە هیدایەتی دەدەیت؟! یاخود ئەو کەسەی لە گومڕایی ئاشکرادا ڕۆچووە ڕێنموویی دەکەیت؟! (دیارە ئەوە حاڵیان بێت هیدایەتیان ئاسان نیە).

(٤١) جا ئەگەر تۆ لەناو بەرین و بتمرێنین، ئەوە ئێمە بێگومان تۆڵەیان هەر لێدەسێنین.

(٤٢) یاخود ئەنجامی ئەوهەڕەشەیەی لێمان کردوون نیشانی تۆی دەدەین، چونکە بێگومان ئێمە تواناما بەسەریاندا هەیە.

(٤٣) کەواتە تۆ بێ خەم بەو پابەندی ئەوەبە کە نیگات بۆ کراوە؛ چونکە تۆ بەڕاستی لەسەر ڕێگە و ڕێباز و بەرنامەیەکی راست و دروستیت (لە لایەن پەروەردگارتەوە ئاراستە دەکرێیت).

(٤٤) بەڕاستی ئەم قورئانە یادخەرەوەیە بۆ خۆت و بۆ قەومەکەت، لە ئایندەشدا پرسیارتان لێدەکرێت دەربارەی.

(٤٥) تۆ لەو پێغەمبەرانەی کە ناردوومانە پێش تۆ بپرسە، ئایا جگە لە خوای میهرەبان خوای ترمان دیاری کردووە کە بەندایەتی بۆ بکرێت.(مەبەست ئەوەیە کە سەرچاوەی هەموو پێغەمبەران یەکێکە)

(٤٦) سوێند بە خوا بێگومان ئێمە موسا پێغەمبەرمان نارد بە بەڵگە و نیشانەکانمانەوە بۆ لای فیرعەون و دارو دەستەی، پێی راگەیاندن کە: بەڕاستی من رەوانەکراوی پەروەردگاری هەموو جیهانیانم.

(٤٧) کەچی کە هاتە لایان بە بەڵگە و موعجیزەکانمانەوە، سەریان سوڕماو گاڵتە و پێکەنینیان بە موعجیزەکانی دەهات.

وَمَا نُرِيهِم مِّنْ ءَايَةٍ إِلَّا هِيَ أَكْبَرُ مِنْ أُخْتِهَا وَأَخَذْنَاهُم
بِالْعَذَابِ لَعَلَّهُمْ يَرْجِعُونَ ﴿٤٨﴾ وَقَالُوا يَا أَيُّهَ السَّاحِرُ ادْعُ لَنَا
رَبَّكَ بِمَا عَهِدَ عِندَكَ إِنَّنَا لَمُهْتَدُونَ ﴿٤٩﴾ فَلَمَّا كَشَفْنَا عَنْهُمُ
الْعَذَابَ إِذَا هُمْ يَنكُثُونَ ﴿٥٠﴾ وَنَادَىٰ فِرْعَوْنُ فِي قَوْمِهِ
قَالَ يَا قَوْمِ أَلَيْسَ لِي مُلْكُ مِصْرَ وَهَٰذِهِ الْأَنْهَارُ تَجْرِي مِن
تَحْتِي أَفَلَا تُبْصِرُونَ ﴿٥١﴾ أَمْ أَنَا خَيْرٌ مِّنْ هَٰذَا الَّذِي هُوَ مَهِينٌ
وَلَا يَكَادُ يُبِينُ ﴿٥٢﴾ فَلَوْلَا أُلْقِيَ عَلَيْهِ أَسْوِرَةٌ مِّن ذَهَبٍ أَوْ جَاءَ
مَعَهُ الْمَلَائِكَةُ مُقْتَرِنِينَ ﴿٥٣﴾ فَاسْتَخَفَّ قَوْمَهُ
فَأَطَاعُوهُ إِنَّهُمْ كَانُوا قَوْمًا فَاسِقِينَ ﴿٥٤﴾ فَلَمَّا آسَفُونَا
انتَقَمْنَا مِنْهُمْ فَأَغْرَقْنَاهُمْ أَجْمَعِينَ ﴿٥٥﴾ فَجَعَلْنَاهُمْ
سَلَفًا وَمَثَلًا لِّلْآخِرِينَ ﴿٥٦﴾ ۞ وَلَمَّا ضُرِبَ ابْنُ مَرْيَمَ
مَثَلًا إِذَا قَوْمُكَ مِنْهُ يَصِدُّونَ ﴿٥٧﴾ وَقَالُوا أَآلِهَتُنَا
خَيْرٌ أَمْ هُوَ مَا ضَرَبُوهُ لَكَ إِلَّا جَدَلًا بَلْ هُمْ قَوْمٌ خَصِمُونَ ﴿٥٨﴾
إِنْ هُوَ إِلَّا عَبْدٌ أَنْعَمْنَا عَلَيْهِ وَجَعَلْنَاهُ مَثَلًا لِّبَنِي إِسْرَائِيلَ
﴿٥٩﴾ وَلَوْ نَشَاءُ لَجَعَلْنَا مِنكُم مَّلَائِكَةً فِي الْأَرْضِ يَخْلُفُونَ ﴿٦٠﴾



(٤٨) هیچ معجزەیەکمان نیشان نەداون، کە لەوی تر گەورەتر نەبووبێت، (جا کە باوەڕیان نەهێناوە) گرفتاری تاڵی و ناخۆشی و سزامان کردن بۆ ئەوەی بگەڕێنەوە و بەخۆدا بچنەوە.

(٤٩) کەچی بە موسایان وت: ئەی جادووگەر!! لە پەروەردگارت داوا بکە بۆمان، بەو پەیمانەی پێتی داوە بابەلاو ناخۆشیمان لەسەر هەڵبگرێت بێگومان ئێمە لە هیدایەت دراوان دەبین!!

(٥٠) جاهەر کە بەلاو ناخۆشیمان لەسەر لابردن خێرا بەڵێن و پەیمانەکەیان هەڵدەوەشاند.

(٥١) فیرعەون جاڕیدا بەناو قەوم و گەلەکەیدا و وتی: ئەی قەوم و گەلم، من پاشای میصرم و فەرمانڕەوای ئەم ولاتەم، ئەم رووبارانەش بەبەر کۆشکەکانمدا دەڕوات، ئایا ئەم دەسەلاتەی من نابینن؟!...

(٥٢) بەڵکو نابینن من چاکترم لەو کەسەی تاوبانگی نییە و کەسایەتیەکی لاوازو نەناسراوە و زمان پاراو نییە و لەوانە نییە بتوانێت چاک خەڵکی تێبگەیەنێت؟!

(٥٣) جا ئەوە بۆچی بازنی ئاڵتون و زێڕی پێشکەش ناکرێت(تانیشانە بێت بۆ پایەداری؟!) یان ئەوە بۆ فریشتە لەگەڵیدا نەهاتن بۆ بانگەواز کردن و پشتیوانی لێکردنی؟!

(٥٤) فیرعەون هیچ نرخی دانەنا بۆ قەوم و گەلەکەی، بە سووکی سەیری دەکردن، ئەوانیش ملکەچ و فەرمانبەرداری بوون، بەراستی ئەوانە قەومێکی فاسق و تاوانبار و گوناهکار بوون.

(٥٥) خوا فەرمووی: جا کاتێک ئێمەیان تووڕە کردو رقی ئێمەیان هەستان، ئێمەش تۆڵەمان لێسەندن، هەر هەموویانمان لە دەریادا خنکاندو نوقم کرد...

(٥٦) جا کردمانن بە پێشەنگی تیاچووەکان و پەند و عیبرەت بۆ خەڵکی تری دوای ئەوان.

(٥٧) کاتێکیش باسی کوڕەکەی مەریەم ـ عیسا ـ بەنموونە هێنرابێتەوە، دەستبەجێ قەوم و هۆزەکەی تۆ ملەجەڕێیان کردووە و سەریان باداوە و تەسلیمی حەق نەبوون (بە باسکردنی سەغڵەت بوون)...

(٥٨) وتوویانە ئایا پەرستراوەکانی ئێمە شایانی پەرستنن یان ئەو؟! واتە ـ عیسا ـ، ئەو نموونانەیان بۆ تۆ نەدەهێنایەوە، تەنها بۆ موجادەلە نەبێت، (وەنەبێت بەشوێن حەق و راستیدا بگەڕێن)، بەڵکو ئەوانە کەسانێکن هەمیشە حەز بە دوژمنایەتی و ئاژاوە و ململانێیی بێ سەروبن دەکەن.

(٥٩) ئەو عیسایە تەنها بەندەیەکی ئێمە بوو کە نازو نیعمەتی پێغەمبەرایەتیمان پێبەخشی و کردمانە نموونەیەکی چاک بۆ نەوەی ئیسرائیل تا شوێنی بکەون.

(٦٠) ئەگەر بمانویستایە ئێوەمان دەکردە فریشتە ولە زەویدا نیشتەجێمان دەکردن و هەموو فەرمانبەردار دەبوون.

وَإِنَّهُۥ لَعِلْمٌ لِّلسَّاعَةِ فَلَا تَمْتَرُنَّ بِهَا وَٱتَّبِعُونِ هَٰذَا صِرَٰطٌ مُّسْتَقِيمٌ ﴿٦١﴾ وَلَا يَصُدَّنَّكُمُ ٱلشَّيْطَٰنُ إِنَّهُۥ لَكُمْ عَدُوٌّ مُّبِينٌ ﴿٦٢﴾ وَلَمَّا جَآءَ عِيسَىٰ بِٱلْبَيِّنَٰتِ قَالَ قَدْ جِئْتُكُم بِٱلْحِكْمَةِ وَلِأُبَيِّنَ لَكُم بَعْضَ ٱلَّذِى تَخْتَلِفُونَ فِيهِ فَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَأَطِيعُونِ ﴿٦٣﴾ إِنَّ ٱللَّهَ هُوَ رَبِّى وَرَبُّكُمْ فَٱعْبُدُوهُ هَٰذَا صِرَٰطٌ مُّسْتَقِيمٌ ﴿٦٤﴾ فَٱخْتَلَفَ ٱلْأَحْزَابُ مِنۢ بَيْنِهِمْ فَوَيْلٌ لِّلَّذِينَ ظَلَمُوا۟ مِنْ عَذَابِ يَوْمٍ أَلِيمٍ ﴿٦٥﴾ هَلْ يَنظُرُونَ إِلَّا ٱلسَّاعَةَ أَن تَأْتِيَهُم بَغْتَةً وَهُمْ لَا يَشْعُرُونَ ﴿٦٦﴾ ٱلْأَخِلَّآءُ يَوْمَئِذٍۭ بَعْضُهُمْ لِبَعْضٍ عَدُوٌّ إِلَّا ٱلْمُتَّقِينَ ﴿٦٧﴾ يَٰعِبَادِ لَا خَوْفٌ عَلَيْكُمُ ٱلْيَوْمَ وَلَآ أَنتُمْ تَحْزَنُونَ ﴿٦٨﴾ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ بِـَٔايَٰتِنَا وَكَانُوا۟ مُسْلِمِينَ ﴿٦٩﴾ ٱدْخُلُوا۟ ٱلْجَنَّةَ أَنتُمْ وَأَزْوَٰجُكُمْ تُحْبَرُونَ ﴿٧٠﴾ يُطَافُ عَلَيْهِم بِصِحَافٍ مِّن ذَهَبٍ وَأَكْوَابٍ وَفِيهَا مَا تَشْتَهِيهِ ٱلْأَنفُسُ وَتَلَذُّ ٱلْأَعْيُنُ وَأَنتُمْ فِيهَا خَٰلِدُونَ ﴿٧١﴾ وَتِلْكَ ٱلْجَنَّةُ ٱلَّتِىٓ أُورِثْتُمُوهَا بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴿٧٢﴾ لَكُمْ فِيهَا فَٰكِهَةٌ كَثِيرَةٌ مِّنْهَا تَأْكُلُونَ ﴿٧٣﴾

(٦١) بەڕاستی لە دایکبوونی عیسا، بەبێ باوک، بەڵگەیە لەسەر قیامەت، کەواتە بەگومان مەبن لێی و باوەڕی پێبهێنن و پێیان بڵێ: هەر پەیڕەوی لە زاتی من بکەن، هەر ئەوەشە ڕێگەی ڕاست و دروست.

(٦٢) خەڵکینە هەوڵ بدەن با شەیتان ڕێتان پێ نەگرێت و لە ڕێی ڕاست لاتان نەدات چونکە بێگومان ئەو دوژمنێکی ئاشکراتانە.

(٦٣) کاتێک عیسا بە موعجیزەی ئاشکراوە ڕەوانەکرا بۆ نەوەی ئیسرائیل وتی: بەڕاستی من حیکمەت و دانایيم بۆ هێناون، هەروەها زانیاری ئەوەشم پێیە کە ئەو شتانەتان بۆ ڕوون بکەمەوە کە کێشەتان لەسەری هەیە و ڕاو بۆچوونتان لەسەری جیاوازە، جا ئێوە لە خوا بترسن و گوێڕایەڵی من بکەن.

(٦٤) بەڕاستی خوای گەورە پەروەردگاری منیش و ئێوەشە، تەنها ئەو بپەرستن، هەر ئەمەشە ڕێگە و ڕێبازی ڕاست و دروست.

(٦٥) پاشان دەستە و گرۆهەکان جیاوازی کەوتە نێوانیان لەسەر عیسا خۆی، وەیل و قوڕبەسەری بۆ ئەوانەی کە ستەمیان کردووە و ستەم دەکەن، لە سزاو ئازاری ڕۆژێکی پڕ ئێش.

(٦٦) ئایا ئەوانە جگەلە هاتنی قیامەت چاوەڕوانی چی تر دەکەن، لە کاتێکدا ئەوان هەستی پێناکەن.

(٦٧) دۆستان و برادەران هەر هەموو لەو ڕۆژەدا دوژمنی یەکترن، هەموو ڕقیان لە یەک دەبێتەوە، جگە لەو کەسانەی کە لەسەر بنچینەی تەقواو خواناسین کۆ بوونەتەوە و برایەتییان بەرپا کردووە.

(٦٨) خوای گەورە پێیان دەفەرموێت: ئەی بەندەکانم ئەمڕۆ ئیتر ئێوە هیچ ترس و بیمێکتان نابێت وهیچ غەم و پەژارەیەک ڕووتان تێ ناکات...

(٦٩) ئەو بەختەوەرانە.ئەو کەسانەن کە کاتی خۆی باوەڕیان هێناوە بە ئایەتەکانی ئێمە و نیشانەکانی دەسەڵاتداریمان لە بوونەوەردا و ئیماندارو موسڵمانیش بوون.

(٧٠) پێیان دەوترێت: فەرموون بچنە بەهەشتەوە خۆتان و هاوسەرانتان، خۆتان و ئەوانەی وەک ئێوە خواناس بوون و لەوێ ژیانی کامەرانی و شادی و بەختەوەریتان پێ دەدرێت.

(٧١) لەسەر سینی وکوپی ئاڵتون جۆرەها خواردن و خواردنەوەی جوان و ڕازاوە و تام خۆش و بۆن خۆشیان بەسەردا دەگێڕن و لەو بەهەشتەدا هەرچی نەفس حەزی لێ بکات و دڵ بیخوازێت و چاو حەز بەدیتنی بکات ئامادەیە و ئێوە؛ ئەی خواناس و پاکان، ژیانی هەمیشەیی و نەبڕاوەشی تیادا دەبەنە سەر.

(٧٢) (خوای میهرەبان ئەوەندەی تر دڵخۆشیان دەکات، کاتێک پێیان دەفەرموێت): ئا ئەو بەهەشتەی کە ئێستا ئێوە بوونەتە خاوەنی، وەک میراتیی شایستەی خۆتانە، بەهۆی ئەو کار و کردەوانەی کە دەتانکرد.

(٧٣) میوەهاتی زۆر و هەمەجۆر تیایدا بۆتان ئامادەیە و لێی دەخۆن (هەرگیز تەواو نابێت و کەم ناکات).

إِنَّ الْمُجْرِمِينَ فِي عَذَابِ جَهَنَّمَ خَالِدُونَ ﴿٧٤﴾ لَا يُفَتَّرُ عَنْهُمْ وَهُمْ فِيهِ مُبْلِسُونَ ﴿٧٥﴾ وَمَا ظَلَمْنَاهُمْ وَلَٰكِن كَانُوا هُمُ الظَّالِمِينَ ﴿٧٦﴾ وَنَادَوْا يَا مَالِكُ لِيَقْضِ عَلَيْنَا رَبُّكَ قَالَ إِنَّكُم مَّاكِثُونَ ﴿٧٧﴾ لَقَدْ جِئْنَاكُم بِالْحَقِّ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَكُمْ لِلْحَقِّ كَارِهُونَ ﴿٧٨﴾ أَمْ أَبْرَمُوا أَمْرًا فَإِنَّا مُبْرِمُونَ ﴿٧٩﴾ أَمْ يَحْسَبُونَ أَنَّا لَا نَسْمَعُ سِرَّهُمْ وَنَجْوَاهُم بَلَىٰ وَرُسُلُنَا لَدَيْهِمْ يَكْتُبُونَ ﴿٨٠﴾ قُلْ إِن كَانَ لِلرَّحْمَٰنِ وَلَدٌ فَأَنَا أَوَّلُ الْعَابِدِينَ ﴿٨١﴾ سُبْحَانَ رَبِّ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ رَبِّ الْعَرْشِ عَمَّا يَصِفُونَ ﴿٨٢﴾ فَذَرْهُمْ يَخُوضُوا وَيَلْعَبُوا حَتَّىٰ يُلَاقُوا يَوْمَهُمُ الَّذِي يُوعَدُونَ ﴿٨٣﴾ وَهُوَ الَّذِي فِي السَّمَاءِ إِلَٰهٌ وَفِي الْأَرْضِ إِلَٰهٌ وَهُوَ الْحَكِيمُ الْعَلِيمُ ﴿٨٤﴾ وَتَبَارَكَ الَّذِي لَهُ مُلْكُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَمَا بَيْنَهُمَا وَعِندَهُ عِلْمُ السَّاعَةِ وَإِلَيْهِ تُرْجَعُونَ ﴿٨٥﴾ وَلَا يَمْلِكُ الَّذِينَ يَدْعُونَ مِن دُونِهِ الشَّفَاعَةَ إِلَّا مَن شَهِدَ بِالْحَقِّ وَهُمْ يَعْلَمُونَ ﴿٨٦﴾ وَلَئِن سَأَلْتَهُم مَّنْ خَلَقَهُمْ لَيَقُولُنَّ اللَّهُ فَأَنَّىٰ يُؤْفَكُونَ ﴿٨٧﴾ وَقِيلِهِ يَا رَبِّ إِنَّ هَٰؤُلَاءِ قَوْمٌ لَّا يُؤْمِنُونَ ﴿٨٨﴾ فَاصْفَحْ عَنْهُمْ وَقُلْ سَلَامٌ فَسَوْفَ يَعْلَمُونَ ﴿٨٩﴾

(٧٤) بەراستی تاوانبار و تاوانکاران لەناو ئازار و سزای دۆزەخدا بەهەمیشەیی دەمێننەوە.

(٧٥) ئازارو سزا لە سەریان کەم ناکرێتەوە، لە کاتێکدا هەموشیان تیایدا نائومێد و بێهیوان.

(٧٦) جا وەنەبێت ئێمە ستەممان لێکردبن بەڵکو هەر خۆیان ستەمکار بوون.

(٧٧) دۆزەخیەکان هاوار دەکەن، ئەی مالک (کە فریشتەی سەرپەرشتیارە): دەبا پەروەردگارت بمانکوژێت، دەبا بمرین و کۆتایی بەم سەغڵەتیەمان بێت، لە وەڵامیاندا دەڵێت: بەراستی ئێوە جێتانە و تیایدا بۆ هەمیشە دەبێت بمێننەوە (ئا بەو شێوەیە قورئان باسی بەختەوەران و باسی بەدبەخت و ناپوختەکان دەخاتە بەرچاو، ئەوسا دێتەوە بۆ دنیا و دەیەوێت پێش ئەوەی ئەو رۆژە بەرپا ببێت خەڵکی فریای خۆیان بکەون):

(٧٨) سوێند بەخوا بەڕاستی ئێمە پەیامی حەق و راستیمان بۆ ئێوە رەوانە کردون کەچی زۆربەتان حەزتان لە حەق و راستی نیە و لێی بێزارن.

(٧٩) ئەوانە هەرکاتێک بڕیارێک بدەن و پیلانێک بگێڕن دژی موسڵمانان، ئەوە بێگومان ئێمە پیلانەکە بەسەریاندا دەشکێنینەوە و بە زەرەری خۆیان تەواوی دەکەین.

(٨٠) ئایا ئەوانە وادەزانن کە ئێمە لە نهێنی و چپەیان بێئاگاین و نابیستین؟! نەخێر وانیە، ئێمە زۆر ئاگادارین و فریشتە چاودێرەکانیشمان کە هەمیشە لە نزیکیانەوەن، وردو درشتی گوفتارو کرداریان تۆمار دەکەن.

(٨١) ئەی پێغەمبەر ﷺ بەو خوانەناسانە بڵێ: ئەگەر خوای میهرەبان کوڕی ببوایە من یەکەم کەس دەبووم لەو کەسانەی کە ملکەچ دەبووم !!

(٨٢) پاکی و بێگەردی بۆ پەروەردگاری ئاسمانەکان و زەوی، بۆ پەروەردگاری عەرش و تەختی فەرمانڕەوایەتی، دەربارەی ئەو گوفتارە ناقۆڵاو بێ سەرو بنانەی کە نەفامان بۆ پەروەردگار هەڵی دەبەستن.

(٨٣) جارێ وازیان لێ بهێنە؛ با هەر رۆبچن لە قسەی هەڵەق و مەڵەقدا و با هەر گەمە و یاری بکەن، هەتا دەگەنە ئەو رۆژەی هەڕەشەیان لێکراوە دەربارەی.

(٨٤) خوا ئەو زاتەیە کە هەر ئەو، خوای ئاسمانە و هەر ئەو خوای زەویشە و هەر ئەوە کە دانا و زانایە.

(٨٥) ئەو زاتەی کە خاوەنی ئاسمانەکان و زەوی و ئێوانیانە زۆر موبارەک و خێربەخش و پاک و بێ گەردە و هەر ئەو دەزانێت کەی قیامەت بەرپا دەبێت، بۆ لای ئەویش دەبرێنەوە.

(٨٦) (ئەوەش چاک بزانن) ئەو رۆژە، ئەوانەی کە ئەوان دەیانپەرستن لە جیاتی خوا تکاو شەفاعەتیان بەدەست نیە، مەگەر کەسێک کە شایەتی راستی دابێت و بزانێت کێ شایستەی تکا بۆکردنە.

(٨٧) سوێند بەخوا ئەگەر لەو خوانەناسانە بپرسیت: کێ دروستی کردوون، ئەوە بەدڵنیاییەوە دەڵێن (الله)؛ کەوابوو بەرەو چی و بەرەو کوێ لە رێبازی یەکخواناسی لادەدرێن و شوێنی ناحەقی دەکەون؟!

(٨٨) سوێند بەگوفتاری پێغەمبەر کە وتی: پەروەردگارا، بەڕاستی ئەمانە قەوم و هۆزێکن، باوەڕ ناهێنن بیرناکەنەوە.

(٨٩) دە تۆش ئەی پێغەمبەر ﷺ لەبەر ئەوە چاوپۆشیان لێ بکە و لێیان ببوورە، سەلامیان لێ بکە و نەرم بە لەگەڵیان، لە ئایندەدا دەزانن چییان بەسەر دێت و خۆیان دەبیننەوە، یاخود تێدەگەن و باوەڕ دەهێنن.



سوورەتی (الدخان)
بەناوی خوای بەخشندە و میهرەبان

(١) سەرنجی سەرەتای سوورەتی (الشوری) بدە
(٢) سوێند بەم قورئانە روون و ئاشکرایە.
(٣) بەراستی ئێمە لە شەوێکی بە فەڕو پیرۆزدا (کە شەوی قەدرە) دامانبەزاندووەتە خوارەوە، بێگومان ئێمە هەمیشە بێدارکەرەوەی بەندەکانمانین.
(٤) لەو شەوەدا هەموو کاروکردەوە و بەرنامەیەکی پڕ لە حیکمەت و دانایی لە یەک جیا دەکرێتەوە.
(٥) ئەمەش فەرمان و بڕیارێکە لەلایەن ئێمەوە، بێگومان ئێمەیش پێغەمبەران دەنێرین.
(٦) رەوانەکردنی ئەم قورئانە، رەحمەتی پەروەردگاری تۆیە بۆ ئادەمیزاد، تا لە سەرگەردانی رزگاری ببێت، بەڕاستی هەر ئەویشە کە بیسەرو زانایەبە هەموو شتێک.
(٧) ئەوزاتە کە پەروەردگاری ئاسمانەکان و زەوی و هەموو ئەو شتانەیە کە لە نێوانیاندایە، ئەگەر ئێوە دڵنیان و باوەڕتان هەیە.
(٨) هیچ خوایەک نییە جگە لەو زاتە، دەژێنێ و دەمرێنێت، پەروەردگاری ئێوەش و باوو باپیرانی دێرینیشتانە.
(٩) لەگەڵ ئەم هەموو بەڵگە و نیشانە گەورە و گرنگانەدا، خوانەناسان لە گومان و دوودڵیدا رۆچوون و سەرگەرمی گەمە و یارین.
(١٠) (ئەوانە هەروا بەسەریانەوە ناچێت) چاوەڕێی رۆژێک بکە کە دوکەڵێکی ئاشکرا بەری ئاسمان دەگرێت.
(١١) هەموو خەڵکی دادەگرێتەوە، بۆیە بە ترسەوە دەڵێن: ئەمە سزاو ئازارێکی بە ئێشە (وا رووی تێ کردووین).
(١٢) بەناچاری دان بەدەسەلاتی خوادا دەنێن و دەڵێن: پەروەردگارا تۆ ئەم سزاو ئازارەمان لەکۆڵ بکەرەوە، بێگومان ئێمە باوەڕدارین !!
(١٣) (تازە بەسەرچوو!! کەی بێداربوونەوە و ئیمان هێنانی ناچاری سوودی هەیە بۆیان)، چۆن و لەکوێ ئامۆژگاری وەردەگرن، لەکاتێکدا پێغەمبەرێکی ئاشکرایان بۆ رەوانە کرابوو.
(١٤) پاشان پشتیان تێکرد و وتیان: فێرکراوێکی شێتە!!
(١٥) ئێمە چاک دەتانناسین، هەر کەمێک سزاو ئازارتان لێ دوور بخەینەوە، بێگومان دەچنەوە دۆخی جاران.
(١٦) رۆژێک دێت هەڵمەتی گەورەی خۆمان بۆ تاوانباران دەبەین وئێمە بەدڵنیاییەوە تۆڵەسێنەرین لە ستەمکاران.
(١٧) سوێند بەخوا بەراستی ئێمە پێش ئەمان قەوم و هۆزی فیرعەونمان تاقیکردەوە، پێغەمبەرێکی بەڕێز و میهرەبانیان بۆ هات .
(١٨) بە فیرعەون و داروودەستەکەی وت: کە بەندەکانی خوا بە من بسپێرن، چونکە بەڕاستی من پێغەمبەرێکی ئەمین و دڵسۆزم بۆ هەمووتان.

وَأَن لَّا تَعْلُوا عَلَى اللَّهِ إِنِّي آتِيكُم بِسُلْطَانٍ مُّبِينٍ ﴿١٩﴾ وَإِنِّي عُذْتُ بِرَبِّي وَرَبِّكُمْ أَن تَرْجُمُونِ ﴿٢٠﴾ وَإِن لَّمْ تُؤْمِنُوا لِي فَاعْتَزِلُونِ ﴿٢١﴾ فَدَعَا رَبَّهُ أَنَّ هَٰؤُلَاءِ قَوْمٌ مُّجْرِمُونَ ﴿٢٢﴾ فَأَسْرِ بِعِبَادِي لَيْلًا إِنَّكُم مُّتَّبَعُونَ ﴿٢٣﴾ وَاتْرُكِ الْبَحْرَ رَهْوًا إِنَّهُمْ جُندٌ مُّغْرَقُونَ ﴿٢٤﴾ كَمْ تَرَكُوا مِن جَنَّاتٍ وَعُيُونٍ ﴿٢٥﴾ وَزُرُوعٍ وَمَقَامٍ كَرِيمٍ ﴿٢٦﴾ وَنَعْمَةٍ كَانُوا فِيهَا فَاكِهِينَ ﴿٢٧﴾ كَذَٰلِكَ وَأَوْرَثْنَاهَا قَوْمًا آخَرِينَ ﴿٢٨﴾ فَمَا بَكَتْ عَلَيْهِمُ السَّمَاءُ وَالْأَرْضُ وَمَا كَانُوا مُنظَرِينَ ﴿٢٩﴾ وَلَقَدْ نَجَّيْنَا بَنِي إِسْرَائِيلَ مِنَ الْعَذَابِ الْمُهِينِ ﴿٣٠﴾ مِن فِرْعَوْنَ إِنَّهُ كَانَ عَالِيًا مِّنَ الْمُسْرِفِينَ ﴿٣١﴾ وَلَقَدِ اخْتَرْنَاهُمْ عَلَىٰ عِلْمٍ عَلَى الْعَالَمِينَ ﴿٣٢﴾ وَآتَيْنَاهُم مِّنَ الْآيَاتِ مَا فِيهِ بَلَاءٌ مُّبِينٌ ﴿٣٣﴾ إِنَّ هَٰؤُلَاءِ لَيَقُولُونَ ﴿٣٤﴾ إِنْ هِيَ إِلَّا مَوْتَتُنَا الْأُولَىٰ وَمَا نَحْنُ بِمُنشَرِينَ ﴿٣٥﴾ فَأْتُوا بِآبَائِنَا إِن كُنتُمْ صَادِقِينَ ﴿٣٦﴾ أَهُمْ خَيْرٌ أَمْ قَوْمُ تُبَّعٍ وَالَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ أَهْلَكْنَاهُمْ إِنَّهُمْ كَانُوا مُجْرِمِينَ ﴿٣٧﴾ وَمَا خَلَقْنَا السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَا لَاعِبِينَ ﴿٣٨﴾ مَا خَلَقْنَاهُمَا إِلَّا بِالْحَقِّ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَهُمْ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٣٩﴾

(١٩) خۆشتان بەگەورە دامەنێن لە بەرامبەر خوای بەرزو بەدەسەڵاتەوە، بێگومان من بەڵگە و نیشانەی گرنگ و بەهێز و ئاشکرام هێناوە بۆتان.

(٢٠) من پەنا دەگرم بە پەروەردگاری خۆم، کە پەروەردگاری ئێوەشە لەوەی کە بەردبارانم بکەن.

(٢١) خۆ ئەگەر هەر باوەڕم پێ ناکەن وازم لێ بهێنن و کارتان بەمنەوە نەبێت.

(٢٢) بەهۆی ئەوەی کە وازیان لێ نەهێنا، هاناو هاواری بردووە بۆ پەروەردگاری: پەروەردگارا، بەڕاستی ئەمانە کۆمەڵێکی تاوانبارن.

(٢٣) ئەوسا ئیتر خوا فەرمانی بۆ نارد کە شەو ڕەوی بکە بەبەندەکانم و شار چۆڵ بکەن، بێگومان ئەوانە بە دواتاندا دێن.

(٢٤) جاکە خۆت و ئیمانداران لە دەریا پەڕینەوە دەریا بەجێ بهێڵە بەواڵا کراوی چونکە بەڕاستی ئەوانە سوپایەکی خنکێنراون تیایدا...

(٢٥) ئەوانە چەندەها باخ و باخات و کانیاوی سازگاری زۆریان بەجێهێشت...

(٢٦) چەندەها کێڵگە و بێستان و جێگە و ڕێگەی خۆشیان لە دوا بەجێما...

(٢٧) جۆرەها نازو نیعمەتی تریش کە ژیانیان بە خۆشی تیایدا دەبردە سەر...

(٢٨) ئا بەو شێوەیە لەوانمان سەندەوە و کردمانە میراتی خەڵکانێکی تر...

(٢٩) جا نە ئاسمان بۆیان گریا و نە زەویش، ساتە وەختێکیش مۆڵەتیان نەدرا...

(٣٠) پاشان ئێمە نەوەی ئیسرائیلمان لە سزای چەوسێنەرەوەی فیرعەون ڕزگارکرد...

(٣١) بەڵێ؛ لەدەست فیرعەون کە زۆر خۆی بەگەورە دەزانی و بە تەواوی لەسنوور دەرچوو بوو...

(٣٢) ئێمە ئەوکاتە نەوەی ئیسرائیلمان هەڵبژارد لە ڕووی ئاگایی و زانیاریەوە و ڕێزی ئەوانماندا بەسەر هەموو خەڵکی ئەو سەردەمەدا...

(٣٣) ئێمە بەڵگە و نیشانەی ئاشکرای زۆرمان پێبەخشین و بەجۆرەها شێوەی ئاشکراو ڕوون تاقیمانکردنەوە.

(٣٤) بەڕاستی ئەوانە (بت پەرستان) دەڵێن:...

(٣٥) ژیانمان تەنها یەک جارە و زیندوو ناکرێینەوە.

(٣٦) ئەگەر زیندووبوونەوە حەقیقەتە، باو و باپیرانمان کە مردوون بیانهێننەوە ئەگەر ئێوە ڕاست دەکەن؟!!

(٣٧) ئایا ئەمانە چاکترن یان قەومی ـ تبع ـ (کە قەومێکی دەسەڵاتدار بوون لە پێش ئیسلامدا، قوڕەیش دەنگوباسی ئازایەتیانی بیستبوو)، هەروەها ئەوانەی پێشیان، ئێمە هەموانیانمان لەناوبرد، بەڕاستی هەرهەموویان تاوانبار بوون.

(٣٨) خۆ ئێمە ئاسمانەکان و زەوی و ئەو شتانەی نێوانیانمان بەگاڵتە و بێهوودە دروست نەکردووە.

(٣٩) (بەڵکو هەمووی) لەسەر بنچینەی حەق و ڕاستی نەبێت دروستمان نەکردوون، بەڵام زۆربەیان لەم ڕاستیە نازانن.

إِنَّ يَوْمَ ٱلْفَصْلِ مِيقَـٰتُهُمْ أَجْمَعِينَ ﴿٤٠﴾ يَوْمَ لَا يُغْنِى مَوْلًى عَن مَّوْلًى شَيْـًٔا وَلَا هُمْ يُنصَرُونَ ﴿٤١﴾ إِلَّا مَن رَّحِمَ ٱللَّهُ ۚ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلرَّحِيمُ ﴿٤٢﴾ إِنَّ شَجَرَتَ ٱلزَّقُّومِ ﴿٤٣﴾ طَعَامُ ٱلْأَثِيمِ ﴿٤٤﴾ كَٱلْمُهْلِ يَغْلِى فِى ٱلْبُطُونِ ﴿٤٥﴾ كَغَلْىِ ٱلْحَمِيمِ ﴿٤٦﴾ خُذُوهُ فَٱعْتِلُوهُ إِلَىٰ سَوَآءِ ٱلْجَحِيمِ ﴿٤٧﴾ ثُمَّ صُبُّوا۟ فَوْقَ رَأْسِهِۦ مِنْ عَذَابِ ٱلْحَمِيمِ ﴿٤٨﴾ ذُقْ إِنَّكَ أَنتَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْكَرِيمُ ﴿٤٩﴾ إِنَّ هَـٰذَا مَا كُنتُم بِهِۦ تَمْتَرُونَ ﴿٥٠﴾ إِنَّ ٱلْمُتَّقِينَ فِى مَقَامٍ أَمِينٍ ﴿٥١﴾ فِى جَنَّـٰتٍ وَعُيُونٍ ﴿٥٢﴾ يَلْبَسُونَ مِن سُندُسٍ وَإِسْتَبْرَقٍ مُّتَقَـٰبِلِينَ ﴿٥٣﴾ كَذَٰلِكَ وَزَوَّجْنَـٰهُم بِحُورٍ عِينٍ ﴿٥٤﴾ يَدْعُونَ فِيهَا بِكُلِّ فَـٰكِهَةٍ ءَامِنِينَ ﴿٥٥﴾ لَا يَذُوقُونَ فِيهَا ٱلْمَوْتَ إِلَّا ٱلْمَوْتَةَ ٱلْأُولَىٰ ۖ وَوَقَىٰهُمْ عَذَابَ ٱلْجَحِيمِ ﴿٥٦﴾ فَضْلًا مِّن رَّبِّكَ ۚ ذَٰلِكَ هُوَ ٱلْفَوْزُ ٱلْعَظِيمُ ﴿٥٧﴾ فَإِنَّمَا يَسَّرْنَـٰهُ بِلِسَانِكَ لَعَلَّهُمْ يَتَذَكَّرُونَ ﴿٥٨﴾ فَٱرْتَقِبْ إِنَّهُم مُّرْتَقِبُونَ ﴿٥٩﴾

سورة الجاثية

(٤٠) بێگومـان دوارۆژ کـە ڕۆژی جیاکردنەوەیـە، وادەی هەموانیانە سەرجەم.

(٤١) ڕۆژێکە هیچ گەورەیەک فریای بچوکی خـۆی ناکـەوێت و هیچیشـیان پشـتگیری نـاکرێن لەلایـەن کەسێکەوە.

(٤٢) مەگەر کەسێک بەزەیی خوا گرتبێتیـەوە بـە ڕاستی تەنها ئەو خوایە بالادەست ومیهرەبانە.

(٤٣) بەڕاستی درەختی ژەقنەبووت (درەختێکە لە نـاخی دۆزەخدا؛ لەناو ئـاگردا؛ خـوای بەدەسـەلات ڕوواندوویـەتی و لـق و پەلـەکانی بـە نـاویدا بـلاو بۆتەوە).

(٤٤) بەرو بوومەکەی خۆراکی تاوانبارانە.

(٤٥) هــەروەک کــانزای تــواوە لــەناو ورگ و ڕیخۆڵەکاندا دەکوڵێت.

(٤٦) وەک کوڵانی ئاوی یەکجار گەرم.

(٤٧) فەرمان دەدرێت: ئەو تاوانبارە بگرن و بەرزی بکەنەوە بەسەر ناوەڕاستی دۆزەخداو بەری بدەنەوە.

(٤٨) لـەوەودوا ئـاگرو ئـاوی زۆر لـەکوڵ بکـەن بەسەریدا.

(٤٩) ئەوسا پێی دەوترێت: دە بچێژە بێگومان تـۆ زۆر خۆتت بەشت دەزانـی و خـۆتـت زۆر بـەماقووڵ دەخستە بەرچاو.

(٥٠) بەڕاستی ئا ئەمە ئەو دۆزەخەیە کـاتی خـۆی گومانتان لێی هەبوو، موجادەلەتان لەسەری دەکرد.

(٥١) (لەولاشـەوە لـە بەهەشـتدا لـە سـایەی میـهرەبانی پـەروەردگاردا): بەراسـتی ئەوانـەی کـە پارێزکارو دیندارن، لە جێگە و شوێنێکی زۆر ئارامدا ژیان دەبەنە سەر.

(٥٢) لە باخچە و باخەکانی بەهەشتدا، لە پاڵ کارێز وڕکانی و تاڤگەکاندا دەژین (هەمیشە لە سەیران و خۆشیدان).

(٥٣) دەپۆشن لە ئاوریشمی تەنک و ئەستوور، لەو کاتەدا، خۆشەویستان بەرامبەر یەک دادەنیشن و (بەرووی خۆشـەوە بـۆ یەکتر دەڕوانن و گفتوگۆی خۆش و بەتام دەکەن).

(٥٤) هەروەها حۆری چاو گەش و گوڵنەندامـمان کردووە بە هاوسەریان.

(٥٥) بانگ دەکەن تیایدا بۆ هەموو جۆرە میوەیەک، بێ ئەوەی بترسن لە تەواو بوون و، نەخۆش کەوتن و لەبەرچاو کەوتن.

(٥٦) لە هەمووی خۆشتر ئەوەیە کە هەرگیز تاڵیی مردن ناچێژن تیایدا جگە لەو مردنـەی یەکـەمجار و پـەروەردگاریان لـە سزای دۆزەخیش بە دووری گرتوون و پاراستوونی.

(٥٧) جا ئەمە ڕێز و فەزڵێکی تایبەتیە لەلایەن پەروەردگاری تۆوە ئەی پێغەمبەرﷺ، ئەی ئیماندار، بەڕاستی تەنها ئەوەیـە سەرکەوتنی گەورە و بێسنوور.

(٥٨) ئەی پێغەمبەرﷺ، کەواتە بۆیە بەزمانی تۆ ئەم قورئانەمان بەروونی و ئاسانی ڕەوانەکردووە، بـۆ ئـەوەی یـادەوەری و ئامۆژگاری وەربگرن و دابچڵەکێن.

(٥٩) کەواتە تۆ ئیتر چاوەڕێی پێش هاتنی بەڵێنەکانی ئێمە بکە لە دنیا و قیامەتدا، چونکە بێگومان ئەوانیش چاوەڕێن!!

سوورەتی (الجاثیة)

بەناوی خوای بەخشندە و میهرەبان

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

حمٓ ﴿١﴾ تَنزِيلُ الْكِتَابِ مِنَ اللَّهِ الْعَزِيزِ الْحَكِيمِ ﴿٢﴾ إِنَّ فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ لَآيَاتٍ لِّلْمُؤْمِنِينَ ﴿٣﴾ وَفِي خَلْقِكُمْ وَمَا يَبُثُّ مِن دَابَّةٍ آيَاتٌ لِّقَوْمٍ يُوقِنُونَ ﴿٤﴾ وَاخْتِلَافِ اللَّيْلِ وَالنَّهَارِ وَمَا أَنزَلَ اللَّهُ مِنَ السَّمَاءِ مِن رِّزْقٍ فَأَحْيَا بِهِ الْأَرْضَ بَعْدَ مَوْتِهَا وَتَصْرِيفِ الرِّيَاحِ آيَاتٌ لِّقَوْمٍ يَعْقِلُونَ ﴿٥﴾ تِلْكَ آيَاتُ اللَّهِ نَتْلُوهَا عَلَيْكَ بِالْحَقِّ فَبِأَيِّ حَدِيثٍ بَعْدَ اللَّهِ وَآيَاتِهِ يُؤْمِنُونَ ﴿٦﴾ وَيْلٌ لِّكُلِّ أَفَّاكٍ أَثِيمٍ ﴿٧﴾ يَسْمَعُ آيَاتِ اللَّهِ تُتْلَىٰ عَلَيْهِ ثُمَّ يُصِرُّ مُسْتَكْبِرًا كَأَن لَّمْ يَسْمَعْهَا فَبَشِّرْهُ بِعَذَابٍ أَلِيمٍ ﴿٨﴾ وَإِذَا عَلِمَ مِنْ آيَاتِنَا شَيْئًا اتَّخَذَهَا هُزُوًا أُولَٰئِكَ لَهُمْ عَذَابٌ مُّهِينٌ ﴿٩﴾ مِّن وَرَائِهِمْ جَهَنَّمُ وَلَا يُغْنِي عَنْهُم مَّا كَسَبُوا شَيْئًا وَلَا مَا اتَّخَذُوا مِن دُونِ اللَّهِ أَوْلِيَاءَ وَلَهُمْ عَذَابٌ عَظِيمٌ ﴿١٠﴾ هَٰذَا هُدًى وَالَّذِينَ كَفَرُوا بِآيَاتِ رَبِّهِمْ لَهُمْ عَذَابٌ مِّن رِّجْزٍ أَلِيمٌ ﴿١١﴾ اللَّهُ الَّذِي سَخَّرَ لَكُمُ الْبَحْرَ لِتَجْرِيَ الْفُلْكُ فِيهِ بِأَمْرِهِ وَلِتَبْتَغُوا مِن فَضْلِهِ وَلَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ ﴿١٢﴾ وَسَخَّرَ لَكُم مَّا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الْأَرْضِ جَمِيعًا مِّنْهُ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَاتٍ لِّقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ ﴿١٣﴾



(١) سەرنجی ئایەتی١ (الشوری) لاپەرە ٤٨٣ بدە.

(٢) ئەم قورئانە لەلایەن خوای بالادەست و داناوە هاتووەتە خوارەوە.

(٣) بەڕاستی لە ئاسمانەکان و زەویدا بەڵگەو نیشانەی زۆر هەن دەربارەی گەورەیی و دەسەڵاتی پەروەردگار بۆ کەسانێک کە بڕوادارن.

(٤) هەروەها لە دروستکردنی ئێوەدا (لە ئەندامەکانی لەشتاندا، لە قۆناغەکانی گەورە بوونتاندا، لە جیاوازی نێرو مێتاندا...هتد)، هەروەها لەو هەموو زیندەوەرە جۆراو جۆرانەی کە لەسەر زەوی وژێر زەوی و ناو ئاودا هەن و بلاویان دەکاتەوە، (لە چوار پێ و باڵندەکان، لە خشۆک و شەش پێکان، لە گیاندارانی هەمەجۆر لە قەبارەو ڕەنگ و شێوازدا، لە دەوریان لە خزمەتکردنی ئادەمیزادا، هەموو ئەوانە) بەڵگە و نیشانەن لەسەر دەسەڵاتی خوا بۆ کەسانێک کە دڵنیان و باوەڕی دامەزراویان هەیە.

(٥) هەروەها لە جیاوازی شەوو ڕۆژدا، لەو ڕزق و ڕۆزیەی کەلە ئاسمانەوە خوا باراندویەتی(وەک باران و تیشکی خۆرو گازەکان و...هتد، کە سەرچاوەی گەشەکردن و پێگەیشتنی ڕوەک و هەموو زیندەوەرانە)، بەو هۆیەوە زەوی زیندوو کردەوە دوای وشک بوون و مردنی، هەروەها لە هاتوچۆو گۆڕان وجوڵەی هەوادا، لە هەر هەموو ئەوانەدا بەڵگە ونیشانەی زۆر هەن بۆ کەسانێک عەقڵ و بیرو هۆشیان دەخەنە کار.

(٦) ئەی محمد ﷺ ئا ئەوانە بەڵگە و نیشانەی دەسەڵاتەکانی خوان، دەیخوێنینەوە بەسەر تۆدا سەرتاپای حەق و ڕاستەقینەیە، جا دوای خواو فەرمانەکانی بە چ گوتار و باسێکی تر باوەڕ دەکەن و ئیمان دەهێنن.

(٧) هاوار و قوڕبەسەری و ڕەنجەڕۆیی تەنها بۆ هەموو ئەو کەسانەی کە زۆر درۆزن و بوختانچی و تاوانبارن.

(٨) هەیانە گوێ دەگرێت بۆ ئایەتەکانی خوا کاتێک بەسەریدا دەخوێنرێتەوە، لەوەودوا سوور دەبێت لەسەر بێباوەڕی و خۆی بەزل دەزانێت، هەروەک نەیبیستبێت، جا مژدەی سزاو ئازارێکی بەئێش بدە بەو جۆرە کەسانە!!

(٩) کاتێک شتێک لە ئایەت و فەرمانەکانی ئێمەی پێ بگات و بیزانێت، ئەوە دەیکاتە هۆی گاڵتەو گەمەجاڕ، ئا ئەوانە سزای خەجاڵەت ئاوەڕو شەرمەزاری چاوەڕێیانە هەر لەم دنیادا...

(١٠) لە قیامەتیشدا؛ دۆزەخ بەدوایانەوەیە و لێی قوتارنابن، هەرچیەکیان کردبوو فریایان ناکەوێت(لە ماڵ و هێزو دەسەڵات)، هەموو ئەوانەش کەلە جیاتی خوا کردبوویان بەپالپشتی خۆیان، جا سزایەکی زۆرگەورە و سامناک بۆیان ئامادەیە.

(١١) ئەم قورئانە ڕێنموویی بەخشە، بەرچاو ڕوونکەرەوەیە، ڕێ نیشاندەرە، ئەوانەش کە باوەڕیان نەبوو بە ئایەت و فەرموودەکانی پەروەردگاریان سزایەکی زۆر سەخت و بە ئێش چاوەڕێیانە.

(١٢) خوا ئەو زاتەیە کە دەریای بۆ ڕام کردوون تا کەشتی بە فەرمانی ئەو هاتووچۆی پیادا بکات، تا بچن بەدەم بەخشش و بەهرەکانیەوە و دەستان کەوێت (لە بازرگانی و ڕاوە ماسی و دەرهێنانی گەوهەر و مرواری و...هتد)بۆ ئەوەی سوپاسگوزاری خوا بکەن.

(١٣) هەرچی لە ئاسمانەکان و زەویدا هەیە بۆ ئێوەی ڕام هێناوە، بۆ خزمەتگوزاری ئێوە فەراهەمی هێناوە، هەموویشی تێکڕا بەخششن لەلایەن ئەو زاتەوە، بەڕاستی ئا لەو بەخشش و دیاردانەدا بەڵگە و نیشانەی زۆرهەن بۆ کەسانێک کە بیربکەنەوە و تێفکرن.

قُل لِّلَّذِينَ ءَامَنُواْ يَغْفِرُواْ لِلَّذِينَ لَا يَرْجُونَ أَيَّامَ ٱللَّهِ لِيَجْزِيَ قَوْمَۢا بِمَا كَانُواْ يَكْسِبُونَ ﴿١٤﴾ مَنْ عَمِلَ صَٰلِحًا فَلِنَفْسِهِۦ وَمَنْ أَسَآءَ فَعَلَيْهَا ثُمَّ إِلَىٰ رَبِّكُمْ تُرْجَعُونَ ﴿١٥﴾ وَلَقَدْ ءَاتَيْنَا بَنِيٓ إِسْرَٰٓءِيلَ ٱلْكِتَٰبَ وَٱلْحُكْمَ وَٱلنُّبُوَّةَ وَرَزَقْنَٰهُم مِّنَ ٱلطَّيِّبَٰتِ وَفَضَّلْنَٰهُمْ عَلَى ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿١٦﴾ وَءَاتَيْنَٰهُم بَيِّنَٰتٍ مِّنَ ٱلْأَمْرِ فَمَا ٱخْتَلَفُوٓاْ إِلَّا مِنۢ بَعْدِ مَا جَآءَهُمُ ٱلْعِلْمُ بَغْيَۢا بَيْنَهُمْ إِنَّ رَبَّكَ يَقْضِي بَيْنَهُمْ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ فِيمَا كَانُواْ فِيهِ يَخْتَلِفُونَ ﴿١٧﴾ ثُمَّ جَعَلْنَٰكَ عَلَىٰ شَرِيعَةٍ مِّنَ ٱلْأَمْرِ فَٱتَّبِعْهَا وَلَا تَتَّبِعْ أَهْوَآءَ ٱلَّذِينَ لَا يَعْلَمُونَ ﴿١٨﴾ إِنَّهُمْ لَن يُغْنُواْ عَنكَ مِنَ ٱللَّهِ شَيْـًٔا وَإِنَّ ٱلظَّٰلِمِينَ بَعْضُهُمْ أَوْلِيَآءُ بَعْضٍ وَٱللَّهُ وَلِيُّ ٱلْمُتَّقِينَ ﴿١٩﴾ هَٰذَا بَصَٰٓئِرُ لِلنَّاسِ وَهُدًى وَرَحْمَةٌ لِّقَوْمٍ يُوقِنُونَ ﴿٢٠﴾ أَمْ حَسِبَ ٱلَّذِينَ ٱجْتَرَحُواْ ٱلسَّيِّـَٔاتِ أَن نَّجْعَلَهُمْ كَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ سَوَآءً مَّحْيَاهُمْ وَمَمَاتُهُمْ سَآءَ مَا يَحْكُمُونَ ﴿٢١﴾ وَخَلَقَ ٱللَّهُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ بِٱلْحَقِّ وَلِتُجْزَىٰ كُلُّ نَفْسٍۭ بِمَا كَسَبَتْ وَهُمْ لَا يُظْلَمُونَ ﴿٢٢﴾

(١٤) ئـەی پێغـەمبـەرﷺ بڵـێ بەوانـەی کـە ئیمانیـان هێنـاوە: چاوپۆشی بکـەن لەوانـەی بـە تـەمای ڕۆژە سـەختەکان نـین کـە خـوا پێشـی دەهێنێت بۆ لێپرسینەوەیان، تا پاداشتی قـەومی نالەبار بداتەوە بەگوێرەی ئەو کاروکردەوەیەی کە ئەنجامی دەدەن...

(١٥) هەر کەسێک کاروکردەوەی چاکی ئەنجام دابێت ئەوە سوود و قازانجەکـەی بـۆ خۆیـەتی، هەروەها ئـەوەش کـاروکردەوەی خراپـی کردبێت ئەویش لەسەرخۆی دەکەوێت، لەوەودواش بۆ لای پەروەردگارتان دەبرێنەوە.

(١٦) سوێند بـەخوا بێگومـان ئێمـە تـەوراتمان بەخشـی بـە ئـەوەی ئیسـرائیل هـاوڕێ لەگـەڵ دەسەڵاتداری بۆ چارەسەرکردنی کێشەی خەڵکی، لەگـەڵ پێغەمبەرایەتیشدا، لـە چـەندەها ڕزق و ڕۆزی چاک و پاکیش بەهرەوەرمان کـردن، زیـادە ڕێزیشمان دان بەسەر هەموو خـەڵکی سـەردەمی خۆیاندا.

(١٧) هەروەها ئێمە چارەسەری هەموو کارێکی گرنگمـان بـۆ ڕوونکردنـەوە و پێمـان بەخشـین (دەربارەی عـەقیدەو شەریعەت وحەڵاڵ وحەرام)، جا ناکۆکی و دووبەرەکیان لە نێواندا بەرپا نـەبوو مەگەر دوای ئەوەی کە هەموو شت ڕوون بـۆوە و زانسـتیان بـۆ هـات، ئـەوەش بـەهۆی سـتەم و ناکۆکی و حەسوودی نێـوان خۆیانـەوە، بەڕاسـتی پـەروەردگاری تـۆ ئـەی محمـدﷺ لـە ڕۆژی قیامەتدا داوەری دەکات لە نێوانیاندا دەربارەی ئـەو شتانەی کە ناکۆکیـان لەسـەری هەیـە و ڕای جیاوازیـان هەیـە دەربارەی.

(١٨) لەوەودوا ئێمە تۆمان ئەی محمدﷺ خستۆتە سەر بەرنامەیەکی ڕاست و ڕەوان لـە هـەموو کـارو بـارێکی ئـەم ئاییـنەدا، کەواتە شوێنی بکەوە و لێی لامەدە، نەکەیت شوێنی هەواو ئارەزووی ئەوانە بکەویت کە نازانن و نافامن.

(١٩) بێگومان ئەوانە هیچ کات فریات ناکەون و لە دەستی خوا ڕزگارت ناکەن (ئەگەر خوا لـە خـۆت بڕەنجێنیت و نافەرمانی بکەیت)، بەڕاستی ستەمکاران هەندێکیان یارو یاوەری هەندێکیانن، خوایـش پشـت و پـەناو خۆشەویسـتی دیندارو چاکانە.

(٢٠) ئەم قورئان و بەرنامەیە چەندەها چاو ڕۆشـنیە بـۆ خـەڵکی و هیدایـەت و ڕێنموویـی و ڕەحمەتـە بـۆ قـەوم و کەسانێک کە باوەڕ بهێنن و پێی دڵنیاو دڵئارام ببن.

(٢١) ئایا ئەوانەی کە گوناهو تاوانەکانیان ئەنجامداوە، وایـان زانیـووە هـەروەک ئەوانـە حسابیان بـۆ دەکـەین کـە ئیمانیان هێناوە و کاروکردەوە چاکەکانیان ئەنجامداوە؟! ژیانی دنیاو مردن و دوای مردنیان وەک یەک دەبێت؟! ئـای کە بڕیاری خراپ بڕیار دەدەن.

(٢٢) خوا ئاسمانەکان و زەوی لەسەر بنەمای حەق و ڕاستی داناوە، بۆ ئەوەی سەرئەنجام پاداشتی هـەموو کەسێک بەگوێرەی کارو کردەوەکانی بداتەوە و هیچ جۆرە ستەمێکیشیان لێ ناکرێت.

أَفَرَءَيْتَ مَنِ ٱتَّخَذَ إِلَٰهَهُۥ هَوَىٰهُ وَأَضَلَّهُ ٱللَّهُ عَلَىٰ عِلْمٍ وَخَتَمَ عَلَىٰ سَمْعِهِۦ وَقَلْبِهِۦ وَجَعَلَ عَلَىٰ بَصَرِهِۦ غِشَٰوَةً فَمَن يَهْدِيهِ مِنۢ بَعْدِ ٱللَّهِ ۚ أَفَلَا تَذَكَّرُونَ ﴿٢٣﴾ وَقَالُوا۟ مَا هِىَ إِلَّا حَيَاتُنَا ٱلدُّنْيَا نَمُوتُ وَنَحْيَا وَمَا يُهْلِكُنَآ إِلَّا ٱلدَّهْرُ ۚ وَمَا لَهُم بِذَٰلِكَ مِنْ عِلْمٍ ۖ إِنْ هُمْ إِلَّا يَظُنُّونَ ﴿٢٤﴾ وَإِذَا تُتْلَىٰ عَلَيْهِمْ ءَايَٰتُنَا بَيِّنَٰتٍ مَّا كَانَ حُجَّتَهُمْ إِلَّآ أَن قَالُوا۟ ٱئْتُوا۟ بِـَٔابَآئِنَآ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ ﴿٢٥﴾ قُلِ ٱللَّهُ يُحْيِيكُمْ ثُمَّ يُمِيتُكُمْ ثُمَّ يَجْمَعُكُمْ إِلَىٰ يَوْمِ ٱلْقِيَٰمَةِ لَا رَيْبَ فِيهِ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٢٦﴾ وَلِلَّهِ مُلْكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۚ وَيَوْمَ تَقُومُ ٱلسَّاعَةُ يَوْمَئِذٍ يَخْسَرُ ٱلْمُبْطِلُونَ ﴿٢٧﴾ وَتَرَىٰ كُلَّ أُمَّةٍ جَاثِيَةً ۚ كُلُّ أُمَّةٍ تُدْعَىٰٓ إِلَىٰ كِتَٰبِهَا ٱلْيَوْمَ تُجْزَوْنَ مَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴿٢٨﴾ هَٰذَا كِتَٰبُنَا يَنطِقُ عَلَيْكُم بِٱلْحَقِّ ۚ إِنَّا كُنَّا نَسْتَنسِخُ مَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴿٢٩﴾ فَأَمَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ فَيُدْخِلُهُمْ رَبُّهُمْ فِى رَحْمَتِهِۦ ۚ ذَٰلِكَ هُوَ ٱلْفَوْزُ ٱلْمُبِينُ ﴿٣٠﴾ وَأَمَّا ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓا۟ أَفَلَمْ تَكُنْ ءَايَٰتِى تُتْلَىٰ عَلَيْكُمْ فَٱسْتَكْبَرْتُمْ وَكُنتُمْ قَوْمًا مُّجْرِمِينَ ﴿٣١﴾ وَإِذَا قِيلَ إِنَّ وَعْدَ ٱللَّهِ حَقٌّ وَٱلسَّاعَةُ لَا رَيْبَ فِيهَا قُلْتُم مَّا نَدْرِى مَا ٱلسَّاعَةُ إِن نَّظُنُّ إِلَّا ظَنًّا وَمَا نَحْنُ بِمُسْتَيْقِنِينَ ﴿٣٢﴾

(٢٣) هەواڵم بدەرێ ئایا ئەو کەسەی کە ویست و ئارەزووی خۆی کردۆتە خوای خۆی؟! بەهۆی ئەوەوە خوایش گومڕای کردووەکە زانیوویەتی شایانی ئەوەیە، لە ئەنجامی بەد هەڵوێستی خۆیدا و مۆری ناوە بە دەزگای بیستن و دڵ و دەروونیدا و پەردەشی هێناوە بەسەر چاوو دەزگای بینینیدا، جا ئیتر کێ هەیە جگە لە خوا هیدایەت و ڕێنموویی بکات، ئایا بیر ناکەنەوە و ئامۆژگاری وەرناگرن.

(٢٤) خوانەناسان دەیانوت: ژیان تەنها ئەم ژیانی دنیایەیە، دەمرین و دەژین بەنۆرە، هەر ڕۆژگارو زەمانە کاریگەرن تیامانداو دەمان مرێنن و هیچی تر! جا ئەوانە وەنەبێت لەسەر بنچینەی هیچ جۆرە زانستی و زانیاریەکێ ئەوە بڵێن بەڵکو تەنها پشت بەگومان ودوودڵی دەبەستن.

(٢٥) کاتێکیش ئایەتەکانی قورئانی ئێمەیان بەسەردا بخوێنرێتەوە (کە بەڵگەی زۆر بەهێزو ڕوونی تێدایە لەسەر زیندووبوونەوە، هەموو بەڵگەیەکیان هاتۆتە سەر ئەوەی) کە دەڵێن: دە باشە باوو باپیرانی مردوومان بۆ زیندوو بکەنەوە ئەگەر ڕاست دەکەن؟! (شایانی باسە کە حەزرەتی عیسا ئەو کارەی بۆ خەڵکی ئەنجامدا بە ویستی خوا، کەچی وتراوە: ئەمە سیحرو جادووە)؟!

(٢٦) ئەی پێغەمبەر ﷺ پێیان بڵێ: (ئەو شتانە بەدەست ئێمە نی‌یە) ئەوە هەرخوایە ژیانتان پێ دەبەخشێت و پاشان دەتانمرێنێت و دوای ئەوە کۆتان دەکاتەوە لە ڕۆژی قیامەتدا کە هیچ گومانی تیادانیە، بەڵام زۆربەی خەڵکی ئەمە نازانن.

(٢٧) هەر خوا خاوەنی ئاسمانەکان و زەویە، ئەو ڕۆژەی کە قیامەت پێش دێت، هەر ئەو ڕۆژە هەرچی بەتاڵپەرست و ناحەق پەرستانە لە زەرەرمەندیەکي زۆر گەورەدا دەبن.

(٢٨) ئەو ڕۆژە دەبینیت هەموو خەڵکی بەچۆکدا هاتوون و لەسەر ئەژنۆو پەنجەکانیان ئامادەن (هەرکەس چاوەڕێ بانگ کردنە بۆ لێپرسینەوە، ئامادەیە دەست بەجێ ڕاپەڕێت و ڕا بکات بۆ بەردەم دادگای پڕ لە دادی پەروەردگار) هەر قەوم و هۆزێک بانگ دەکرێت بۆ لای ئەو کتێبەی کە بۆی ڕەوانە کراوە، یاخود بانگ دەکرێت بۆ لای نامەی کردەوەکانی، ئەوسا پێیان دەوترێت: ئەمڕۆ ئیتر پاداشتی ئەو کاروکردەوانەی کە دەتانکرد دەدرێتەوە.

(٢٩) ئەمە ئیتر نامەی کردەوەکانتانە کە تۆمارمان کردووە لەسەرتان، خۆی گۆیایە قسەدەکات و حەق وێژە (دیارە کردەوەکانمان تۆمار کراوە لەسەر دەزگای زۆر پێشکەوتوو) چونکە بەڕاستی ئێمە کاتی خۆی ئەوەی ئێوە دەتانکرد لەبەرمان دەگرتەوە.

(٣٠) جا ئەو کاتە ئەوانەی باوەڕیان هێناوە وە کاروکردەوە چاکەکانیان ئەنجام داوە، ئەوە پەروەردگاریان دەیانخاتە ژێر سایەی ڕەحمەت و میهرەبانی خۆیەوە، تەنها ئەوە سەرکەوتن و سەرفرازیەکی ئاشکرایە.

(٣١) بەڵام ئەوانەی کە بێبڕواو کافربوون پێیان دەوترێت: باشە، ئێوە ئایەتەکانی منتان بەسەردا نەدەخوێنرایەوە؟! کەچی خۆتان بەگەورە و زل دەزانی، بەڕاستی ئێوە هۆزێکی تاوانبارو تاوانکار بوون.

(٣٢) کاتێکیش بوترایە: بێگومان بەڵێنی خوا ڕاستە و ڕۆژی قیامەت هەر دێت و گومانی تیادا نیە، ئێوە لە وەڵامدا دەتانوت: ئێمە هەر نازانین ڕۆژی قیامەت چیە؟! ئێمە هەر گومان دەبەین و دڵنیا نین!!

وَبَدَا لَهُمْ سَيِّئَاتُ مَا عَمِلُوا وَحَاقَ بِهِم مَّا كَانُوا بِهِ يَسْتَهْزِئُونَ ﴿٣٣﴾ وَقِيلَ الْيَوْمَ نَنسَاكُمْ كَمَا نَسِيتُمْ لِقَاءَ يَوْمِكُمْ هَٰذَا وَمَأْوَاكُمُ النَّارُ وَمَا لَكُم مِّن نَّاصِرِينَ ﴿٣٤﴾ ذَٰلِكُم بِأَنَّكُمُ اتَّخَذْتُمْ آيَاتِ اللَّهِ هُزُوًا وَغَرَّتْكُمُ الْحَيَاةُ الدُّنْيَا ۚ فَالْيَوْمَ لَا يُخْرَجُونَ مِنْهَا وَلَا هُمْ يُسْتَعْتَبُونَ ﴿٣٥﴾ فَلِلَّهِ الْحَمْدُ رَبِّ السَّمَاوَاتِ وَرَبِّ الْأَرْضِ رَبِّ الْعَالَمِينَ ﴿٣٦﴾ وَلَهُ الْكِبْرِيَاءُ فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ ۖ وَهُوَ الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ ﴿٣٧﴾

سُورَةُ الأَحْقَافِ

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

حم ﴿١﴾ تَنزِيلُ الْكِتَابِ مِنَ اللَّهِ الْعَزِيزِ الْحَكِيمِ ﴿٢﴾ مَا خَلَقْنَا السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَا إِلَّا بِالْحَقِّ وَأَجَلٍ مُّسَمًّى ۚ وَالَّذِينَ كَفَرُوا عَمَّا أُنذِرُوا مُعْرِضُونَ ﴿٣﴾ قُلْ أَرَأَيْتُم مَّا تَدْعُونَ مِن دُونِ اللَّهِ أَرُونِي مَاذَا خَلَقُوا مِنَ الْأَرْضِ أَمْ لَهُمْ شِرْكٌ فِي السَّمَاوَاتِ ۖ ائْتُونِي بِكِتَابٍ مِّن قَبْلِ هَٰذَا أَوْ أَثَارَةٍ مِّنْ عِلْمٍ إِن كُنتُمْ صَادِقِينَ ﴿٤﴾ وَمَنْ أَضَلُّ مِمَّن يَدْعُو مِن دُونِ اللَّهِ مَن لَّا يَسْتَجِيبُ لَهُ إِلَىٰ يَوْمِ الْقِيَامَةِ وَهُمْ عَن دُعَائِهِمْ غَافِلُونَ ﴿٥﴾



(٣٣) ئەو کاتە لە قیامەتدا ئەو کارو کردەوە ناشیرینیانە کە کردوویانە بۆیان دەردەکەوێت و ئاشکرا دەبێت، ئەوەش کە گاڵتەیان پێدەکرد و بڕوایان پێی نەبوو(کە سزاو ئازاری دۆزەخە) لە هەموو لایەکەوە دەوریان دەدات و ڕێگەی ڕزگارییان لێ دەبڕێت.

(٣٤) پێیان دەوترێت: لەمڕۆ بەدواوە ئیتر ئێوە فەرامۆش دەکەین و پشت گوێتان دەخەین، هەروەکو چۆن ئێوە بڕوا بوونتان بەم ڕۆژە فەرامۆش کرد، شوێنی نیشتەجێ و حەوانەوەشتان ناو ئاگری دۆزەخە، کەسیشتان دەست ناکەوێت پشتیوانی و پشتگیریتان لێ بکات.

(٣٥) ئەم سەرئەنجامەش بۆیە یەخەی پێگرتن چونکە بەڕاستی کاتی خۆی گاڵتەتان بە ئایەت و فەرمانەکانی خوا دەهات، ژیانی دنیاش غەڕاو گومڕای کردبوون، ئەمڕۆ ئیتر ڕزگاربوونیان نەستەمە لەو ئاگری دۆزەخە لێی دەرناهێنرێن، داوای ئەوەشیان لێناکرێت خوا لەخۆیان ڕازی بکەن.

(٣٦) جا هەر لە بۆ خوایە سوپاس و ستایش، کە پەروەردگاری ئاسمانەکانە، پەروەردگاری زەویشە، پەروەردگاری هەموو جیهانیان.

(٣٧) هەرچی گەورەیی و شکۆمەندی هەیە لە ئاسمانەکان و زەویدا هەر شایستەی ئەوە، بەڕاستی ئەو زاتە باڵادەست و دانایە.

سوورەتی (الأحقاف)

بەناوی خوای بەخشندە و میهرەبان

(١) سەرنجی سەرەتای سوورەتی الشوری بدە. (٢) ئەم قورئانە لەلایەن خوای باڵادەست و داناوە دابەزیووە.

(٣) ئێمە ئاسمانەکان و زەوی و ئەم هەموو شتانەی نێوانیانمان دروست نەکردووە؛ تەنها لەسەر بنچینەی حەق و ڕاستی نەبێت، بۆ کاتێکی دیاریکراویش، کەچی بێ باوەڕان پشت هەڵدەکەن لەو ئاگاداری و بێدارکردنەوەیە.

(٤) ئەی محمد ﷺ هەواڵم بدەنێ: ئایا سەرنجتان داوە لەو شتانەی کە لە جیاتی خوا دەیانپەرستن و، هاناو هاواریان بۆ دەبەن؟ باشە ئاخر ئەوانە چ شتێکیان لە زەویدا بەدیهێناوە، با پیشانم بدەن!.. یاخود ئەوانە لە هەڵسوڕانی ئاسمانەکاندا هیچ هاوبەشی وهاوکاریەکیان هەیە؟!.. (ئەگەر دەڵێن: بەڵێ) دەکەواتە کتێبێکی ئاسمانیم نیشان بدەن کە پێش ئەم قورئانە بۆتان هاتبێت، یان دیاردەیەکی زانستی لەو ڕووەوە کە بیسەلمێنێت ئەگەر ئێوە ڕاست دەکەن!

(٥) جا ئیتر کێ لەو کەسە گومڕاترە کە دۆعاو نزا و پاڕانەوە؛ ڕوو بەکەسێک یان شتێک دەکات، جگە لە خوا، کە ئەگەر هەتا ڕۆژی قیامەتیش لێی بپاڕێتەوە بێسوودە، نە بەهانایەوە دەچێت، نە بە پەرستنەکەش دەزانێت، لە کاتێکدا ئەوانە لە دۆعاو پاڕانەوەی ئەوان بێ ئاگاو غافڵن و هەستی پێ ناکەن.

وَإِذَا حُشِرَ ٱلنَّاسُ كَانُوا۟ لَهُمْ أَعْدَآءً وَكَانُوا۟ بِعِبَادَتِهِمْ كَٰفِرِينَ ﴿٦﴾ وَإِذَا تُتْلَىٰ عَلَيْهِمْ ءَايَٰتُنَا بَيِّنَٰتٍ قَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ لِلْحَقِّ لَمَّا جَآءَهُمْ هَٰذَا سِحْرٌ مُّبِينٌ ﴿٧﴾ أَمْ يَقُولُونَ ٱفْتَرَىٰهُ ۖ قُلْ إِنِ ٱفْتَرَيْتُهُۥ فَلَا تَمْلِكُونَ لِى مِنَ ٱللَّهِ شَيْـًٔا ۖ هُوَ أَعْلَمُ بِمَا تُفِيضُونَ فِيهِ ۖ كَفَىٰ بِهِۦ شَهِيدًۢا بَيْنِى وَبَيْنَكُمْ ۖ وَهُوَ ٱلْغَفُورُ ٱلرَّحِيمُ ﴿٨﴾ قُلْ مَا كُنتُ بِدْعًا مِّنَ ٱلرُّسُلِ وَمَآ أَدْرِى مَا يُفْعَلُ بِى وَلَا بِكُمْ ۖ إِنْ أَتَّبِعُ إِلَّا مَا يُوحَىٰٓ إِلَىَّ وَمَآ أَنَا۠ إِلَّا نَذِيرٌ مُّبِينٌ ﴿٩﴾ قُلْ أَرَءَيْتُمْ إِن كَانَ مِنْ عِندِ ٱللَّهِ وَكَفَرْتُم بِهِۦ وَشَهِدَ شَاهِدٌ مِّنۢ بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ عَلَىٰ مِثْلِهِۦ فَـَٔامَنَ وَٱسْتَكْبَرْتُمْ ۖ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَهْدِى ٱلْقَوْمَ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿١٠﴾ وَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ لِلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَوْ كَانَ خَيْرًا مَّا سَبَقُونَآ إِلَيْهِ ۚ وَإِذْ لَمْ يَهْتَدُوا۟ بِهِۦ فَسَيَقُولُونَ هَٰذَآ إِفْكٌ قَدِيمٌ ﴿١١﴾ وَمِن قَبْلِهِۦ كِتَٰبُ مُوسَىٰٓ إِمَامًا وَرَحْمَةً ۚ وَهَٰذَا كِتَٰبٌ مُّصَدِّقٌ لِّسَانًا عَرَبِيًّا لِّيُنذِرَ ٱلَّذِينَ ظَلَمُوا۟ وَبُشْرَىٰ لِلْمُحْسِنِينَ ﴿١٢﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ قَالُوا۟ رَبُّنَا ٱللَّهُ ثُمَّ ٱسْتَقَٰمُوا۟ فَلَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ ﴿١٣﴾ أُو۟لَٰٓئِكَ أَصْحَٰبُ ٱلْجَنَّةِ خَٰلِدِينَ فِيهَا جَزَآءًۢ بِمَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴿١٤﴾

(٦) کاتێکیش کە خەڵکی کۆدەکرێنەوە بۆ لێ پرسینەوە، بت و پەرستراوەکان دەبنە دوژمن بۆ ئەو کەسانە کە لە دنیادا دەیانپەرستن، بە هیچ شێوەیەک بڕوایان پێ ناکەن، بەڵکو بە درۆیان دەخەنەوە.

(٧) لەکاتێکدا ئایەتە ئاشکراو روونەکانی ئێمە بەسەریاندا بخوێنرێتەوە، ئەوانەی کە بێ باوەڕ بوون بەو حەق و راستیەی کە بۆیان دێت دەڵێن: ئەمە جادوویەکی ئاشکرایە.

(٨) یاخود دەڵێن: محمد ﷺ خۆی ئەم قورئانەی هەڵبەستووە.. پێیان بڵێ: ئەگەر خۆم هەڵم بەستبێت، (ئەوە دڵنیابن خوا تۆڵەم لێدەسێنێت و سزام دەدات)، ئەوکاتە ئێوە بەهیچ شێوەیەک ناتوانن لە خەشم و قینی خوا رزگارم بکەن، جا هەر خوا دەزانێت دەربارەی ئەم قورئانە ئێوە چ درۆ و بوختانێک هەڵدەبەستن وتێیدا رۆدەچن؟ لەبەرئەوە خوام بەسە کە شایەت بێت لە نێوان من و ئێوەدا، بەڕاستی ئەوزاتە لێبووردەو بەسۆزو میهرەبانە (بۆ ئەوانەی پەشیمان دەبنەوە لە بیروبۆچوونە چەوتەکانیان و رێگەی ئیمان دەگرنە بەر).

(٩) ئەی پێغەمبەر ﷺ پێیان بڵێ: کە من یەکەم پێغەمبەرو تازە پەیدابوو نیم، ناشزانم چیم بەسەر دێت، چیش بەسەر ئێوە دێت؟ (چونکە غەیب زان نیم ولە نهێنی و شاراوەکان ئاگادار نیم)، من تەنها شوێنی ئەو وەحی و نیگایە دەکەوم کە پێم دەگات و من تەنها بێدارکەرەوەیەکی ئاشکرام.

(١٠) هەروەها پێیان بڵێ: هەواڵم بدەنێ، باشە، ئەی ئەوە چۆنە وحاڵتان چۆن دەبێت ئەگەرئەم قورئانە لەلایەن خواوە بێت و، ئێوە ئاوا بڕوای پێنەکەن؟! هاوکات لەگەڵ ئەوەدا کە شایەتێک لە نەوەیئیسرائیل شایەتی داوە کە چ تەورات و، چ قورئان لەیەک سەرچاوەوە هاتوون، ئەو باوەڕی هێنا بە محمد ﷺ و قورئان کەچی ئێوە خۆتان بەزل و گەورە زانی و، باوەڕتان نەهێنا.. بێگومان خوا هیدایەت و رێنمویی دەستەی ستەمکاران ناکات.

(١١) ئەوانەی کە بێباوەڕن دەربارەی ئەوانەی ئیمان و باوەڕیان هێناوە دەڵێن: ئەگەر باوەڕهێنان بەقورئان وبە محمد ﷺ چاک بوایە، ئەوانە پێش ئێمە نەدەکەوتن!! جا چونکە خۆیان هیدایەت و رێنمویی قورئان وەرناگرن دەڵێن: ئەمە هەڵبەستراو و ئەفسانەیەکی کۆنە!!

(١٢) خۆ پێش ئەم قورئانە، تەوراتی موسا رەوانەکراوە تا پێشەواو رەحمەت بێت لەکاتی خۆیدا.. ئەم قورئانەش پەیامێکە سەلمێنەری پەیام و کتێبەکانی پێش خۆیەتی و، رێکە لەگەڵیانداو بەزمانێکی عەرەبی پاراوی ڕەوان هاتووە بۆ ئەوەی ئەوانەی ستەمیان کردووە بێداریان بکاتەوە مژدە بەخشیشە بە چاکەکاران.

(١٣) بەڕاستی ئەوانەی کە دەڵێن: پەروەردگارمان ـ اللە ـ یەو، پاشان پابەندی ئەو ئیمانە دەبن وراست ورەوان پەیڕەوی دەکەن و لەسەری بەردەوامن، ئەوانە هیچ جۆرە ترس و بیمێکیان لەسەر نییە و دڵتەنگ نابن...

(١٤) ئەوانە بەهەشتین و ژیانی نەمریی تیایدا دەبەنە سەر، لە پاداشتی ئەو کاروکردەوانەدا کە ئەنجامیان دەدا.

وَوَصَّيْنَا ٱلْإِنسَٰنَ بِوَٰلِدَيْهِ إِحْسَٰنًا ۖ حَمَلَتْهُ أُمُّهُۥ كُرْهًا وَوَضَعَتْهُ كُرْهًا ۖ وَحَمْلُهُۥ وَفِصَٰلُهُۥ ثَلَٰثُونَ شَهْرًا ۚ حَتَّىٰٓ إِذَا بَلَغَ أَشُدَّهُۥ وَبَلَغَ أَرْبَعِينَ سَنَةً قَالَ رَبِّ أَوْزِعْنِىٓ أَنْ أَشْكُرَ نِعْمَتَكَ ٱلَّتِىٓ أَنْعَمْتَ عَلَىَّ وَعَلَىٰ وَٰلِدَىَّ وَأَنْ أَعْمَلَ صَٰلِحًا تَرْضَىٰهُ وَأَصْلِحْ لِى فِى ذُرِّيَّتِىٓ ۖ إِنِّى تُبْتُ إِلَيْكَ وَإِنِّى مِنَ ٱلْمُسْلِمِينَ ﴿١٥﴾ أُو۟لَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ نَتَقَبَّلُ عَنْهُمْ أَحْسَنَ مَا عَمِلُوا۟ وَنَتَجَاوَزُ عَن سَيِّـَٔاتِهِمْ فِىٓ أَصْحَٰبِ ٱلْجَنَّةِ ۖ وَعْدَ ٱلصِّدْقِ ٱلَّذِى كَانُوا۟ يُوعَدُونَ ﴿١٦﴾ وَٱلَّذِى قَالَ لِوَٰلِدَيْهِ أُفٍّ لَّكُمَآ أَتَعِدَانِنِىٓ أَنْ أُخْرَجَ وَقَدْ خَلَتِ ٱلْقُرُونُ مِن قَبْلِى وَهُمَا يَسْتَغِيثَانِ ٱللَّهَ وَيْلَكَ ءَامِنْ إِنَّ وَعْدَ ٱللَّهِ حَقٌّ فَيَقُولُ مَا هَٰذَآ إِلَّآ أَسَٰطِيرُ ٱلْأَوَّلِينَ ﴿١٧﴾ أُو۟لَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ حَقَّ عَلَيْهِمُ ٱلْقَوْلُ فِىٓ أُمَمٍ قَدْ خَلَتْ مِن قَبْلِهِم مِّنَ ٱلْجِنِّ وَٱلْإِنسِ ۖ إِنَّهُمْ كَانُوا۟ خَٰسِرِينَ ﴿١٨﴾ وَلِكُلٍّ دَرَجَٰتٌ مِّمَّا عَمِلُوا۟ ۖ وَلِيُوَفِّيَهُمْ أَعْمَٰلَهُمْ وَهُمْ لَا يُظْلَمُونَ ﴿١٩﴾ وَيَوْمَ يُعْرَضُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ عَلَى ٱلنَّارِ أَذْهَبْتُمْ طَيِّبَٰتِكُمْ فِى حَيَاتِكُمُ ٱلدُّنْيَا وَٱسْتَمْتَعْتُم بِهَا فَٱلْيَوْمَ تُجْزَوْنَ عَذَابَ ٱلْهُونِ بِمَا كُنتُمْ تَسْتَكْبِرُونَ فِى ٱلْأَرْضِ بِغَيْرِ ٱلْحَقِّ وَبِمَا كُنتُمْ تَفْسُقُونَ ﴿٢٠﴾

(١٥) ئێمە فەرمانمان بە ئادەمیزاد داوە کە چاکەکارو چاک رەفتار بێت لەگەڵ دایک و باوکیدا، دایکی بە ئازارەوە هەڵی‌گرتووە و بەدەم ئێش و ئازارەوە بوویەتی، سک پڕبوون و لە شیر بڕینەوەی سی دانە مانگی خایاندووە .. هەتا کاتێک ئینسان دەگاتە حاڵەتی توندوتۆڵی و توانایی و تەمەنی چل ساڵی (ئەوسا ئیتر حەق وایە ئەم دۆعایە بکاتە یەکێک لە وێردەکانی سەر زاری و) بڵێت: پەروەردگارا! کۆمەکیم بکەو یارمەتیم بدە تا شوکرانە بژێر و سوپاسگوزاری ئەو نازو نیعمەتانە بم کەبە من و دایک و باوکمت بەخشیووە، هەروەها یارمەتیم بدە لەوجۆرە کاروکردەوە چاکانە ئەنجام بدەم، کە تۆ پێی رازیت، داواکاریشم چاکە بڕوێنیت لەناو نەوەکانمدا لەبەر قازانجی خۆم (چاکەی هەرکەس بەشی دایک و باوکی تیادایە)، بەڕاستی من گەڕاومەتەوە بۆلای تۆ، تا لە گوناهەکانم خۆش ببیت ومن لە موسڵمانانی گوێڕایەڵ و فەرمانبەردارم.

(١٦) ئا ئەوانە ئەو کەسانەن کە بە گوێرەی چاکترینی کردەوەکانیان پاداشتیان دەدەینەوە، چاوپۆشیش لەهەڵەو گوناهەکانیان دەکەین لە ڕیزی بەهەشتی‌یەکاندا، ئەمەش بەدەستهێنانی ئەوبەڵێنە ڕاست و دروستەیە کە کاتی خۆی پێیان درابوو.

(١٧) بەڵام ئەوەی کە بێزارە لە دایک و باوکی باوەڕداری و پێیان دەڵێت: ئاخ و ئۆف لە دەست ئێوە، ئایا ئێوە هەڕەشەم لی دەکەن، ئێوە چۆن بڕواتان بەوە هەیە من دوای مردن لە گۆڕ دەربهێنرێم و زیندوو ببمەوە!! لە کاتێکدا ئەو هەموو خەڵکەش ساڵەهایە و سەدەهایە دەمرن و پێش من مردوون..(کوان؟! لە کوێن بۆ یەکێکیان نەگەڕایەوە؟!).. دایک وباوکەکەش زۆر بەپەرۆشەوە دۆعاو نزادەکەن و لەخوا دەپاڕێنەوە..کورە هاوار بۆتۆ، داد لەدەست تۆ، ئیمان و باوەڕبهێنە، بێگومان بەڵێنی خوا حەق و ڕاستە، کەچی(مێشکی پووچە و پەردەی هێناوە بەسەرچاوو دڵیدا)، بێ هیچ بیرکردنەوەیەک دەڵێت: ئەمە قسەیەکی‌کۆنە و داستانی پێشووەکانە!!

(١٨) ئا ئەو جۆرە کەسانە ئەوانەن کە بڕیاری خوایان لەسەر خۆیان کردووە بە ماڵ و چەسپاوە لەسەریان، هاوڕێ لەگەڵ چەندەها گرۆو دەستە و میللەتانی تری ڕابوردووی بێباوەڕی پێش خۆیان، لە هەردوو بەرەی پەری و ئادەمیزاد، بەڕاستی ئەوانە هەرهەموویان خەسارەتمەند و زەرەرمەند بوون.

(١٩) هەر دەستەیەک، هەر کەسێک لە ئیمانداران یان لە بێ بڕواکان پلەو پایەی بەرز، یان نزمیان هەیە، بە گوێرەی کردەوەکانیان کە ئەنجامیانداوە، ئەمەش بۆ ئەوەیە خوای پەروەردگار بەگوێرەی کردەوەکانیان بە تەواوی پاداشتیان بداتەوە، بێ ئەوەی هیچ جۆرە ستەمێکیان لی بکرێت.

(٢٠) ڕۆژێک دێت ئەوانەی کە بێ‌بڕوان بەرەو دۆزەخ دەبرێن و نیشانیان دەدرێت و پێیان دەوترێت: هەرچی خۆشی و شادیەکتان هەبوو لە ژیانی دنیاتاندا ئەنجامتاندا بەئارەزووی خۆتان ڕاتانبوارد، کەوابوو ئەمڕۆ ئیتر نۆرەی ئەوەیە کە سزای خەجاڵەتی و ڕیسوایی بدرێنەوە، بەهۆی ئەوەی کە لووت بەرزیتان دەکرد لەزەویدا بە ناحەق و بەهۆی دەرچوونتان لە سنوور و فەرمانی خوا.



﴿وَاذْكُرْ أَخَا عَادٍ إِذْ أَنذَرَ قَوْمَهُ بِالْأَحْقَافِ وَقَدْ خَلَتِ النُّذُرُ مِن بَيْنِ يَدَيْهِ وَمِنْ خَلْفِهِ أَلَّا تَعْبُدُوا إِلَّا اللَّهَ إِنِّي أَخَافُ عَلَيْكُمْ عَذَابَ يَوْمٍ عَظِيمٍ ﴿٢١﴾ قَالُوا أَجِئْتَنَا لِتَأْفِكَنَا عَنْ آلِهَتِنَا فَأْتِنَا بِمَا تَعِدُنَا إِن كُنتَ مِنَ الصَّادِقِينَ ﴿٢٢﴾ قَالَ إِنَّمَا الْعِلْمُ عِندَ اللَّهِ وَأُبَلِّغُكُم مَّا أُرْسِلْتُ بِهِ وَلَٰكِنِّي أَرَاكُمْ قَوْمًا تَجْهَلُونَ ﴿٢٣﴾ فَلَمَّا رَأَوْهُ عَارِضًا مُّسْتَقْبِلَ أَوْدِيَتِهِمْ قَالُوا هَٰذَا عَارِضٌ مُّمْطِرُنَا بَلْ هُوَ مَا اسْتَعْجَلْتُم بِهِ رِيحٌ فِيهَا عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿٢٤﴾ تُدَمِّرُ كُلَّ شَيْءٍ بِأَمْرِ رَبِّهَا فَأَصْبَحُوا لَا يُرَىٰ إِلَّا مَسَاكِنُهُمْ كَذَٰلِكَ نَجْزِي الْقَوْمَ الْمُجْرِمِينَ ﴿٢٥﴾ وَلَقَدْ مَكَّنَّاهُمْ فِيمَا إِن مَّكَّنَّاكُمْ فِيهِ وَجَعَلْنَا لَهُمْ سَمْعًا وَأَبْصَارًا وَأَفْئِدَةً فَمَا أَغْنَىٰ عَنْهُمْ سَمْعُهُمْ وَلَا أَبْصَارُهُمْ وَلَا أَفْئِدَتُهُم مِّن شَيْءٍ إِذْ كَانُوا يَجْحَدُونَ بِآيَاتِ اللَّهِ وَحَاقَ بِهِم مَّا كَانُوا بِهِ يَسْتَهْزِئُونَ ﴿٢٦﴾ وَلَقَدْ أَهْلَكْنَا مَا حَوْلَكُم مِّنَ الْقُرَىٰ وَصَرَّفْنَا الْآيَاتِ لَعَلَّهُمْ يَرْجِعُونَ ﴿٢٧﴾ فَلَوْلَا نَصَرَهُمُ الَّذِينَ اتَّخَذُوا مِن دُونِ اللَّهِ قُرْبَانًا آلِهَةً بَلْ ضَلُّوا عَنْهُمْ وَذَٰلِكَ إِفْكُهُمْ وَمَا كَانُوا يَفْتَرُونَ ﴿٢٨﴾

(٢١) ئەی پێغەمبەرﷺ یادی براکەی قەومی عاد ـ هود پێغەمبەر ـ بکە، کاتێک قەومەکەی بێدارکردنەوە لە دۆڵ و بیابانەکاندا (مەبەست ناوچەی حضرموت)ە، بێگومان بێدارخەرەوەی زۆر لە پێش ئەو و دوای ئەویش تێپەڕیان کرد، هەر هەموویان ئەوەیان بەخەڵکی ڕاگەیاندووە کە جگە لە خوا کەسی تر نەپەرستن.. بەڕاستی من دەترسم سزایەکی زۆر گەورە و بێسنوورتان لە ڕۆژێکی سامناکدا بۆ پێش بێت.

(٢٢) خوانەناسانی قەومەکەی پێیان وت: ئایا تۆ بۆ ئەوە هاتوویت کە ئێمە لە بەندایەتی خواکانمان لابدەیت؟! کەواتە ئەگەر لە ڕاستگۆیانی ئەو هەڕەشانەی کە لێمان دەکەیت، پێشی بێنە بۆمان!

(٢٣) هود وتی: ڕوودانی ئەو سزایانە و زانینی کاتەکەی بەڕاستی تەنها هەر لای خوا خۆیەتی، من ئەوەم لەسەرە کە ئەوەی من بۆی ڕەوانە کراوم پێتان ڕابگەیەنم، بەڵام بەداخەوە ئێوە بە قەوم و هۆزێکی نەزان و نەفام دەبینم.

(٢٤) جاکاتێک پەڵە هەورێکیان بینی ڕووی کردۆتە دۆڵ وناوچەکەیان، دڵیان خۆشبوو، وتیان: ئەمە بارانی پێیە بۆمان، نەخێر، وانیە، بەڵکو ئەوە ئەو کارەساتەیە پەلەتانە پێش بێت، ڕەشەبایەکی توند، کە سزایەکی بەئازارو بە ئێشی پێیە.

(٢٥) ئەو ڕەشەبایە؛ هەموو شتێک و هەموو شوێنێک کاول دەکات بە فەرمانی پەروەردگاری، ئیتر کەسیان دیار نەمان جگە ماڵە چۆڵ و هۆڵەکانیان، هەر ئا بەو شێوەیە و بەو جۆرە سزایانە تۆڵە لە قەوم و هۆزو گەلانی تاوانبارو تاوانکار دەسێنین (لە هەموو کات و شوێنێکدا، ئەگەر یاخی ببن)...

(٢٦) سوێند بەخوا بەڕاستی ئێمە دەسەلات و توانایەکی وامان بەخشی بە قەومی ـ عاد ـ، کە بە ئێوەمان نەبەخشیوە، هەروەها هۆکاری بیستن و بینین و لێکدانەوەشمان پێدابوون، مەخابن هۆکارەکانی بیستن و بینین و لێکدانەوە سوودی پێنەگەیاندن! ئەمەش لەبەرئەوە بوو چونکە بە بەڵگەو نیشانەکانی خوا بێباوەڕ بوون و، بەرپەرچیان دەدایەوە.. ئەو سزایەی کە گاڵتەیان پێی دەهات، داوێن گیریان بوو، لێی دەرباز نەبوون.

(٢٧) بێگومانیش ئێمە دانیشتوانی شارو دێهاتەکانی دەوروبەرتانمان لەناو برد (کاتێک یاخی بوون لە بەرنامەی ئێمە)، بەڵگە و نیشانەی جۆراو جۆریشمان خستە بەرچاویان، بۆ ئەوەی بگەڕێنەوە بۆلای ئیمان و ڕوو بکەنەوە باوەڕ.

(٢٨) جائەو بتانەی کە بەتەما بوون لەخوا نزیکیان بخەنەوەو لەکاتی تەنگانەدا فریایان بکەون!! دەبا فریایان بکەوتنایە؟! بەڵکو هەر لێیان ون بوون و ئاسەواریان نەما، ئائەوەبوو درۆکەیان و ئەوەش بوو کە هەڵیاندەبەست (کە گوایە ئەم بتانە بۆیە دەپەرستن تا لە خوا نزیکیان بکەنەوە، فریایان بکەون !).

وَإِذْ صَرَفْنَآ إِلَيْكَ نَفَرًا مِّنَ ٱلْجِنِّ يَسْتَمِعُونَ ٱلْقُرْءَانَ فَلَمَّا حَضَرُوهُ قَالُوٓا۟ أَنصِتُوا۟ ۖ فَلَمَّا قُضِىَ وَلَّوْا۟ إِلَىٰ قَوْمِهِم مُّنذِرِينَ ﴿٢٩﴾ قَالُوا۟ يَٰقَوْمَنَآ إِنَّا سَمِعْنَا كِتَٰبًا أُنزِلَ مِنۢ بَعْدِ مُوسَىٰ مُصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ يَدَيْهِ يَهْدِىٓ إِلَى ٱلْحَقِّ وَإِلَىٰ طَرِيقٍ مُّسْتَقِيمٍ ﴿٣٠﴾ يَٰقَوْمَنَآ أَجِيبُوا۟ دَاعِىَ ٱللَّهِ وَءَامِنُوا۟ بِهِۦ يَغْفِرْ لَكُم مِّن ذُنُوبِكُمْ وَيُجِرْكُم مِّنْ عَذَابٍ أَلِيمٍ ﴿٣١﴾ وَمَن لَّا يُجِبْ دَاعِىَ ٱللَّهِ فَلَيْسَ بِمُعْجِزٍ فِى ٱلْأَرْضِ وَلَيْسَ لَهُۥ مِن دُونِهِۦٓ أَوْلِيَآءُ ۚ أُو۟لَٰٓئِكَ فِى ضَلَٰلٍ مُّبِينٍ ﴿٣٢﴾ أَوَلَمْ يَرَوْا۟ أَنَّ ٱللَّهَ ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ وَلَمْ يَعْىَ بِخَلْقِهِنَّ بِقَٰدِرٍ عَلَىٰٓ أَن يُحْۦِىَ ٱلْمَوْتَىٰ ۚ بَلَىٰٓ إِنَّهُۥ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ ﴿٣٣﴾ وَيَوْمَ يُعْرَضُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ عَلَى ٱلنَّارِ أَلَيْسَ هَٰذَا بِٱلْحَقِّ ۖ قَالُوا۟ بَلَىٰ وَرَبِّنَا ۚ قَالَ فَذُوقُوا۟ ٱلْعَذَابَ بِمَا كُنتُمْ تَكْفُرُونَ ﴿٣٤﴾ فَٱصْبِرْ كَمَا صَبَرَ أُو۟لُوا۟ ٱلْعَزْمِ مِنَ ٱلرُّسُلِ وَلَا تَسْتَعْجِل لَّهُمْ ۚ كَأَنَّهُمْ يَوْمَ يَرَوْنَ مَا يُوعَدُونَ لَمْ يَلْبَثُوٓا۟ إِلَّا سَاعَةً مِّن نَّهَارٍۭ ۚ بَلَٰغٌ ۚ فَهَلْ يُهْلَكُ إِلَّا ٱلْقَوْمُ ٱلْفَٰسِقُونَ ﴿٣٥﴾

سُورَةُ مُحَمَّدٍ

(٢٩) یادی ئەوەش بکەکاتێک ئێمە دەستەیەک پەریمان لادایە لای تۆ، تا گوێ لە قورئان بگرن، ئەوسا ئامادەبوون و بەیەکتریان وت: گوێ بگرن و بێ دەنگ بن، کاتێک قورئان خوێندنەکە تەواو بوو، پەریەکان گەڕانەوە بۆ ناو هۆزو قەومەکەیان و، دەستیان کرد بە ئاگادارکردنەوەو بانگکردنیان بۆ پەیرەویکردنی ئەم ئاینە نوێیە.

(٣٠) وتیان: ئەی هۆز و گەلی ئێمە! باوەڕ بکەن ؛ گوێمان لە کتێبێک بوو کە لە دوای موسا نێردراوە، سەلمێنەری پەیام و کتێبەکانی پێش خۆیەتی و رێکە لەگەڵیاندا و، رێنموویی و هیدایەت دەدات بۆ حەق و راستە شەقامی راست و دروستیش.

(٣١) ئەی خزمینە!! بچن بەدەم بانگخوازی خواوە و ئیمان و باوەڕی پێبهێنن، ئەو کاتە لە گوناهەکانتان خۆش دەبێت و لە سزای بە ئێش و ئازار دەتانپارێزێت.

(٣٢) جا ئەوەی پێشوازی لە بانگخوازی خوا ناکات، ئەوە وەنەبێت لە دەسەڵاتی خوا لەم سەر زەویەدا دەرباز ببێت و خوا دەسەوسان بکات، کەسیش ناتوانێت جگە لە خوا رزگاری بکات و پشتیوانی لێ بکات، ئا ئەوانە لە گومڕایی و سەرلێشێواویەکی زۆر ئاشکرادان.

(٣٣) ئایا ئەوە سەرنجیان نەداوە بەراستی ئەو خوایەی کە ئاسمانەکان و زەوی دروست کردووە و لە دروست کردنیشیاندا هیچ ماندوو نەبووە، توانای نییە مردووەکان زیندوو بکاتەوە، بەڵێ، بێگومان ئەو زاتە، بەسەر هەموو شتێکدا دەسەڵاتی هەیە.

(٣٤) رۆژێک دێت کافرو خوانەناسان دۆزەخیان نیشان دەدرێت و پێیان دەوترێت: ئێستا دەڵێن چی؟! ئا ئەمە ئیتر حەق و حەقیقەت و راستەقینە نیە؟! (هەموو بەیەکدەنگ) دەڵێن: بەڵێ.. سوێند بە پەروەردگارمان راستە و حەقە، (بەلام ئەو سوێند خواردن و دان پێدانانە؛ تازە بێ سوودە)، بۆیە خوا دەفەرموێت: مادەم وایە سزاو ئەشکەنجەی ناو ئاگر بچێژن لە سەرئەنجامی بێبڕوایی و کافربوونتاندا.

(٣٥) کەوابوو ئەی پێغەمبەر ﷺ دان بەخۆدا بگرەو خۆڕاگربە، هەروەکو پێغەمبەرانی خاوەن ویستی بەهێز خۆڕاگر بوون، پەلەشیان لێ مەکە، ئەو رۆژەی کە بەڵێنیان دراوەتێ هەر کاتێک پێشهات وادەزانن تەنها ساتە وەختێکیان لە رۆژێکدا پێچووە، ئەمە بەڵێن و پەیام و راگەیاندنێکی تەواوە، جا ئەو کاتە مەگەر تەنها تاوانبارو گوناهکاران نین کە تیادەچن؟!

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ وَصَدُّوا۟ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ أَضَلَّ أَعْمَٰلَهُمْ ﴿١﴾ وَٱلَّذِينَ
ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ وَءَامَنُوا۟ بِمَا نُزِّلَ عَلَىٰ مُحَمَّدٍ وَهُوَ ٱلْحَقُّ مِن
رَّبِّهِمْ كَفَّرَ عَنْهُمْ سَيِّـَٔاتِهِمْ وَأَصْلَحَ بَالَهُمْ ﴿٢﴾ ذَٰلِكَ بِأَنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟
ٱتَّبَعُوا۟ ٱلْبَٰطِلَ وَأَنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱتَّبَعُوا۟ ٱلْحَقَّ مِن رَّبِّهِمْ كَذَٰلِكَ يَضْرِبُ
ٱللَّهُ لِلنَّاسِ أَمْثَٰلَهُمْ ﴿٣﴾ فَإِذَا لَقِيتُمُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ فَضَرْبَ ٱلرِّقَابِ حَتَّىٰٓ
إِذَآ أَثْخَنتُمُوهُمْ فَشُدُّوا۟ ٱلْوَثَاقَ فَإِمَّا مَنًّۢا بَعْدُ وَإِمَّا فِدَآءً حَتَّىٰ تَضَعَ ٱلْحَرْبُ
أَوْزَارَهَا ذَٰلِكَ وَلَوْ يَشَآءُ ٱللَّهُ لَٱنتَصَرَ مِنْهُمْ وَلَٰكِن لِّيَبْلُوَا۟ بَعْضَكُم
بِبَعْضٍ وَٱلَّذِينَ قُتِلُوا۟ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ فَلَن يُضِلَّ أَعْمَٰلَهُمْ ﴿٤﴾ سَيَهْدِيهِمْ
وَيُصْلِحُ بَالَهُمْ ﴿٥﴾ وَيُدْخِلُهُمُ ٱلْجَنَّةَ عَرَّفَهَا لَهُمْ ﴿٦﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ
ءَامَنُوٓا۟ إِن تَنصُرُوا۟ ٱللَّهَ يَنصُرْكُمْ وَيُثَبِّتْ أَقْدَامَكُمْ ﴿٧﴾ وَٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟
فَتَعْسًا لَّهُمْ وَأَضَلَّ أَعْمَٰلَهُمْ ﴿٨﴾ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ كَرِهُوا۟ مَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ
فَأَحْبَطَ أَعْمَٰلَهُمْ ﴿٩﴾ ۞ أَفَلَمْ يَسِيرُوا۟ فِى ٱلْأَرْضِ فَيَنظُرُوا۟ كَيْفَ
كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ دَمَّرَ ٱللَّهُ عَلَيْهِمْ وَلِلْكَٰفِرِينَ أَمْثَٰلُهَا ﴿١٠﴾
ذَٰلِكَ بِأَنَّ ٱللَّهَ مَوْلَى ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَأَنَّ ٱلْكَٰفِرِينَ لَا مَوْلَىٰ لَهُمْ ﴿١١﴾



سوورەتی (محمد) ﷺ

بەناوی خوای بەخشندە و میهرەبان

(١) ئەوانەی بێبڕوا بوون و بەرهەڵستی رێبازی خوایان کرد، ئەوانە خوا کاروکردەوەکانیانی ون و پووچ کردۆتەوە، (تەنانەت چاکەکانیشیان بێ پاداشتە، چونکە مەبەستیان خوا نەبووە).

(٢) ئەوانەش باوەڕیان هێناوە و کارو کردەوە چاکەکانیان ئەنجامداوە و باوەڕیان هێناوە بەو قورئانە بووە کە بۆ محمد ﷺ دابەزێنراوە، هەر ئەویش راستەو لە لایەن پەروەردگاریانەوە، ئەوانە خوا چاوپۆشی کردووە لە هەموو گوناهەکانیان، چاکەشی رواندووە لە دڵ و دەروونیانداو بۆچوونیانی رێکۆ پێک کردووە.

(٣) ئەوەش بەهۆی ئەوەوەیە چونکە بەراستی ئەوانەی کە بێ باوەڕ بوون شوێنی ناڕاستی کەوتبوون.. بێگومان ئەوانەش باوەڕیان هێناوە و موسڵمان بوون، شوێنی حەق و راستیەک کەوتوون کەلە لایەن پەروەردگارەوە هاتووە، ئا بەو شێوەیە خوا نموونەی ئەو دوو کۆمەڵە روون دەکاتەوە بۆ خەڵکی (تا فریای خۆیان بکەون).

(٤) (ئەم فەرمانە بۆ کاتی رووبەڕوو بوونەوەیە لە گۆڕەپانی جەنگدا) جا کاتێک گەیشتن بەوانەی بێباوەڕ بوون، بێنە دەست لێیان و لە گەردنیان بدەن (ئەگینا ئەوان ئێوە دەکوژن)، تا کاتێک کوشتاری زۆریان لێ دەکەن، ئینجا کە هێزیان نەما، بەدیل بیانگرن بەتوندی باڵبەستیان بکەن، ئەوسا یەکێک لەم دوو کارەیان لەگەڵدا ئەنجام بدەن: یان بە پیاوەتی و منەت؛ یاخود بەگۆڕینەوەو فیدیە ئازادیان بکەن، تا شەڕ کۆتایی دێت و ئاسەواری نامێنێت و دوژمنان چەک دادەنێن، بڕیارەکە ئاوەهایە، ئەگەر خوا بیویستایە خۆی تۆڵەی لێ دەسەندن، بەڵام دەیەوێت بەیەکتر تاقیتان بکاتەوە، ئەوانەش لە پێناوی خوادا شەهید بوون، هەرگیز پاداشتی هەوڵ و کۆششیان بەزایە نادات.

(٥) ئەوانە رێنموویی دەکات بۆ جێگە و رێگەی خۆش و دڵ و دەرون و بیرو هۆشیان ئاسوودە دەکات.

(٦) هەروەها دەیانخاتە ئەو بەهەشتەوە کە بە جۆرەها شێواز بۆی باس کردوون.

(٧) ئەی ئەو کەسانەی ئیمان و باوەڕتان هێناوە، ئەگەر ئێوە پشتیوانی لە ئاینی خوا بکەن و هەوڵی سەرکەوتنی بدەن، ئەوە خوایش پشتیوانی لە ئێوە دەکات و سەرتان دەخات و پایەدارو جێگیرتان دەکات.

(٨) ئەوانەش بێبڕوا بوون خەجاڵەتی و سەرشۆڕیان بۆ هەیەو کاروکردەوەشیان لە دنیادا بێ ئاکامەو لە قیامەیتشدا مایە پووچن.

(٩) ئائەوە بەهۆی ئەوەوەیە بێگومان ئەوان رقیان لە قورئان بۆتەوە و حەزیان لە بەرنامەی خوا نەبووە، جا خوایش کارو کردەوەکانی پووچ کردنەوە.

(١٠) ئایا ئەوە نەگەڕاون بەسەر زەویداو سەرنج بدەن، تا بزانن سەرەنجامی ئەوخەڵکە نالەبارەی پێش ئەمان چۆن بووە؟! خوای بە دەسەڵات ماڵ و حاڵیانی بەسەردا رووخاندن، جا بۆ هەموو بێباوەڕان سزای ئاوا شتێکی چاوەڕوان کراوە (درەنگ یان زوو) دووچاریان دەبێت.

(١١) ئەوە بەهۆی ئەوەوەیە چونکە بەراستی خوا پشتگیرو پشتیوانی ئەوانەیە کە ئیمان و باوەڕیان هێناوە، بێگومان بێباوەڕانیش هیچ پشتیوانێکیان نیە.

إِنَّ ٱللَّهَ يُدْخِلُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ جَنَّٰتٍ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ ۖ وَٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ يَتَمَتَّعُونَ وَيَأْكُلُونَ كَمَا تَأْكُلُ ٱلْأَنْعَٰمُ وَٱلنَّارُ مَثْوًى لَّهُمْ ﴿١٢﴾ وَكَأَيِّن مِّن قَرْيَةٍ هِىَ أَشَدُّ قُوَّةً مِّن قَرْيَتِكَ ٱلَّتِىٓ أَخْرَجَتْكَ أَهْلَكْنَٰهُمْ فَلَا نَاصِرَ لَهُمْ ﴿١٣﴾ أَفَمَن كَانَ عَلَىٰ بَيِّنَةٍ مِّن رَّبِّهِۦ كَمَن زُيِّنَ لَهُۥ سُوٓءُ عَمَلِهِۦ وَٱتَّبَعُوٓا۟ أَهْوَآءَهُم ﴿١٤﴾ مَّثَلُ ٱلْجَنَّةِ ٱلَّتِى وُعِدَ ٱلْمُتَّقُونَ ۖ فِيهَآ أَنْهَٰرٌ مِّن مَّآءٍ غَيْرِ ءَاسِنٍ وَأَنْهَٰرٌ مِّن لَّبَنٍ لَّمْ يَتَغَيَّرْ طَعْمُهُۥ وَأَنْهَٰرٌ مِّنْ خَمْرٍ لَّذَّةٍ لِّلشَّٰرِبِينَ وَأَنْهَٰرٌ مِّنْ عَسَلٍ مُّصَفًّى ۖ وَلَهُمْ فِيهَا مِن كُلِّ ٱلثَّمَرَٰتِ وَمَغْفِرَةٌ مِّن رَّبِّهِمْ ۖ كَمَنْ هُوَ خَٰلِدٌ فِى ٱلنَّارِ وَسُقُوا۟ مَآءً حَمِيمًا فَقَطَّعَ أَمْعَآءَهُمْ ﴿١٥﴾ وَمِنْهُم مَّن يَسْتَمِعُ إِلَيْكَ حَتَّىٰٓ إِذَا خَرَجُوا۟ مِنْ عِندِكَ قَالُوا۟ لِلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْعِلْمَ مَاذَا قَالَ ءَانِفًا ۚ أُو۟لَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ طَبَعَ ٱللَّهُ عَلَىٰ قُلُوبِهِمْ وَٱتَّبَعُوٓا۟ أَهْوَآءَهُمْ ﴿١٦﴾ وَٱلَّذِينَ ٱهْتَدَوْا۟ زَادَهُمْ هُدًى وَءَاتَىٰهُمْ تَقْوَىٰهُمْ ﴿١٧﴾ فَهَلْ يَنظُرُونَ إِلَّا ٱلسَّاعَةَ أَن تَأْتِيَهُم بَغْتَةً ۖ فَقَدْ جَآءَ أَشْرَاطُهَا ۚ فَأَنَّىٰ لَهُمْ إِذَا جَآءَتْهُمْ ذِكْرَىٰهُمْ ﴿١٨﴾ فَٱعْلَمْ أَنَّهُۥ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا ٱللَّهُ وَٱسْتَغْفِرْ لِذَنۢبِكَ وَلِلْمُؤْمِنِينَ وَٱلْمُؤْمِنَٰتِ ۗ وَٱللَّهُ يَعْلَمُ مُتَقَلَّبَكُمْ وَمَثْوَىٰكُمْ ﴿١٩﴾

(١٢) بەڕاستی ئەوانەی کە باوەڕیان هێناوە وکارو کردەوە چاکەکانیان ئەنجام داوە، خوا دەیانخاتە باخەکانی بەهەشتەوە، کە چەندەها روبار بە ناویدا دەڕوات، ئەوانەش بێبڕوا بوون لەم دنیایەدا رادەبوێرن و دەخۆن وەک ئاژەڵ، لە ئایندەشدا دۆزەخ جێ و شوێنیانە!

(١٣) زۆر شارو شارۆچکەمان لەناو برد، لەو شارەی کە تۆیان دەرکرد بەهێزتر بوون، هیچ کەسیش نەیتوانی پشتیوانیان بێت.

(١٤) ئایا ئەو کەسەی‌کە لەلایەن پەروەردگاریەوە بەڵگە و نیشانەی روونی پێگەیشتووە و، باوەڕی دامەزراوی پێیەتی و لەسەری دەڕوات، وەکو ئەو کەسە وایە کە کاروکردەوەی ناشرین و نادروستی لەبەرچاو رازێنرابێتەوە، ئەو جۆرە کەسانە شوێنی ویست و ئارەزووی ناپوختی خۆیان کەوتوون؟!

(١٥) وێنەی ئەو بەهەشتەی کەبەڵێن دراوە بدرێت بەخواناس و پارێزکاران، ئەمەیە: چەندەها رووباری لەئاوی سازگارو تام و نەگۆڕاوی تێدایە، هەروەها چەندەها رووباری شیر کە تامی تێک نەچووە، هەروەها چەندەها روبار لە شەرابی تام خۆش و بۆنخۆش، (کە لە خواردنەوەی بێزار نابن و لەبەر چاویان ناکەوێت) بۆ ئەوانەی دەیخۆنەوە، چەندەها روبار لە هەنگوینی پاڵفتەو بێگەرد، هەروەها بۆیان هەیە لەو بەهەشتەدا لە هەموو جۆرە بەرو و بووم و میوەیەکی جوان و بەتام و بۆنخۆش، هاوکات لەگەڵ لێخۆشبوون و خۆشەویستی پەروەردگاریاندا، ئایا ئەو بەختەوەرانە وەکو ئەو کەسانە وان کە لەناو ئاگری دۆزەخدا نەمرن و ئاوی لەکوڵ دەکرێت بەگەروویاندا، کە ریخۆڵەکانیان پارچە پارچە و توێ توێ دەکات؟!

(١٦) ئەی محمد ﷺ هەندێک لەو بێباوەڕو دووڕوانە دێن وگوێت بۆ دەگرن، هەتا کاتێک لە قسە و گوفتارت بوویتەوە، جێت دەهێڵن و بە دوودڵیەوە دەپرسن لە ئیمانداران: ئەوە باسی چی دەکرد؟ ئەوە لەچی دەدوا؟ ئا ئەوانە خوا مۆری ناوە بەسەر دڵیاندا و شوێنی ئارەزوو ویستی نەگونجاوی خۆیان کەوتوون.

(١٧) ئەوانەش رێبازی هیدایەت و ئیمانداریان گرتۆتە بەر بەگوفتاری پێغەمبەر ﷺ هیدایەت و دینداریان گەشە دەکات و پەرە دەسێنێت، خوایش شارەزایی و پارێزکاریی و دڵنیایی زیاتری پێبەخشین .

(١٨) ئایا ئەوانە چاوەڕێی چی دەکەن جگە لە قیامەت کە لەناکاو یەخەیان پێ بگرێت؟ چونکە بەراستی هەندێک لە نیشانەکانی دەرکەوتووە (کە یەکێک لەوانە رەوانەکردنی دواهەمین پێغەمبەرە)، جا ئەوکاتە کە بەرپا بێت بیرکردنەوە و ئامۆژگاریان چ سوودێکی دەبێت ؟!

(١٩) ئەی ئینسان !! دەی کەواتە چاک بزانە و دڵنیابە جگە لە خوا ، هیچ خوایەکی ترنیە، داوای لێخۆشبوونی گوناه بۆ خۆت و ئیمانداران لە پیاوان و ئافرەتان هەر لەو بکە و دڵنیابە کە خوا دەزانێت لە رۆژدا بەچییەوە خەریکن و، لەشەویشدا لەکوێ دەحەوێنەوە و ئارام دەگرن، یاخود دەزانێت چی دەکەن لە دنیاداو، دەرەنجامەکەشی لە قیامەتدا چۆنە.

وَيَقُولُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَوْلَا نُزِّلَتْ سُورَةٌ فَإِذَآ أُنزِلَتْ سُورَةٌ مُّحْكَمَةٌ وَذُكِرَ فِيهَا ٱلْقِتَالُ رَأَيْتَ ٱلَّذِينَ فِى قُلُوبِهِم مَّرَضٌ يَنظُرُونَ إِلَيْكَ نَظَرَ ٱلْمَغْشِىِّ عَلَيْهِ مِنَ ٱلْمَوْتِ فَأَوْلَىٰ لَهُمْ ﴿٢٠﴾ طَاعَةٌ وَقَوْلٌ مَّعْرُوفٌ فَإِذَا عَزَمَ ٱلْأَمْرُ فَلَوْ صَدَقُواْ ٱللَّهَ لَكَانَ خَيْرًا لَّهُمْ ﴿٢١﴾ فَهَلْ عَسَيْتُمْ إِن تَوَلَّيْتُمْ أَن تُفْسِدُواْ فِى ٱلْأَرْضِ وَتُقَطِّعُوٓاْ أَرْحَامَكُمْ ﴿٢٢﴾ أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ لَعَنَهُمُ ٱللَّهُ فَأَصَمَّهُمْ وَأَعْمَىٰٓ أَبْصَٰرَهُمْ ﴿٢٣﴾ أَفَلَا يَتَدَبَّرُونَ ٱلْقُرْءَانَ أَمْ عَلَىٰ قُلُوبٍ أَقْفَالُهَآ ﴿٢٤﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ ٱرْتَدُّواْ عَلَىٰٓ أَدْبَٰرِهِم مِّنۢ بَعْدِ مَا تَبَيَّنَ لَهُمُ ٱلْهُدَى ٱلشَّيْطَٰنُ سَوَّلَ لَهُمْ وَأَمْلَىٰ لَهُمْ ﴿٢٥﴾ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ قَالُواْ لِلَّذِينَ كَرِهُواْ مَا نَزَّلَ ٱللَّهُ سَنُطِيعُكُمْ فِى بَعْضِ ٱلْأَمْرِ وَٱللَّهُ يَعْلَمُ إِسْرَارَهُمْ ﴿٢٦﴾ فَكَيْفَ إِذَا تَوَفَّتْهُمُ ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ يَضْرِبُونَ وُجُوهَهُمْ وَأَدْبَٰرَهُمْ ﴿٢٧﴾ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمُ ٱتَّبَعُواْ مَآ أَسْخَطَ ٱللَّهَ وَكَرِهُواْ رِضْوَٰنَهُۥ فَأَحْبَطَ أَعْمَٰلَهُمْ ﴿٢٨﴾ أَمْ حَسِبَ ٱلَّذِينَ فِى قُلُوبِهِم مَّرَضٌ أَن لَّن يُخْرِجَ ٱللَّهُ أَضْغَٰنَهُمْ ﴿٢٩﴾

(٢٠) هەندێک لە ئیمانداران دەڵێن: خۆزگە سوورەتێک (دەربارەی جەنگ دژی کافران دەهاتە خوارەوە)، کەچی کاتێک کە سورەتێک بە روونی دادەبەزێت و باسی جەنگی تێدایە، ئەوە دەبینیت ئەوانەی لە دڵیاندا نەخۆشی باوەڕ لاوازی ودووڕوویی هەیە، چاویان نەبڵەق دەبێت، سەیرت دەکەن وەکو کەسێک لە سەرەمەرگدا بێ هۆشی بەسەردا هاتبێت، جا باشتر وابوو...

(٢١) کە گوێڕایەڵ بونایە و قسەی جوان و بەجێیان بکردایە، جا کاتێک کار گەیشتە قایمی و جەنگ بەرپابوو ئەگەر لەگەڵ خوادا راست بوونایە، ئەوە چاکتر بوو بۆیان.

(٢٢) ئایا ئێوە بەتەمان ئەگەر لە غەزا پشت هەڵبکەن یاخود دەسەڵاتتان کەوتە دەست، تۆوی ئاژاوەو فەساد و تاوان لە زەودا بچێنن و هەرچی پەیوەندی خزمایەتیش هەیە بیپچڕێنن و لە ناوی بەرن؟!

(٢٣) ئەو جۆرە کەسانە ئەوانەن کە خوا نەفرینی لێ کردوون و کەڕی کردوون و کوێرایی هێناوە بەسەر چاویاندا (ڕاستیەکان نابینن).

(٢٤) ئایا ئەوە بۆچی ئەوانە وردبینی لە قورئاندا ناکەن و گوێی بۆ ناگرن؟! یان ئەوەیە دڵەکان لە ئاستی راستیدا قفڵ دراوە؟!

(٢٥) بەڕاستی ئەوانەی پاشگەز بوونەوەو بەرەودوا گەڕانەوە، دوای ئەوەی ڕێگەی هیدایەت و ئیمانیان بۆ دەرکەوتبوو، ئەوانە شەیتان بەفێڵ و تەڵەکە تەماداری کرد بوون، بەهیوای تەمەن درێژی و خۆشگوزەرانیش فریوی دابوون.

(٢٦) ئەو زاڵ بوونی شەیتانە بەهۆی ئەوەوە بوو کە بەڕاستی دووڕووەکان دەیانوت بەوانەی کە داخ لە دڵ بوون بەرامبەر ئەوەی خوا دایبەزاندووە کە قورئانە: ئێمە لەمەودوا لە هەندێک هەڵوێستدا بەقسەتان دەکەین، خوایش خۆی چاک ئاگادارە لەو نهێنی و پیلانانەی کە دەیشارنەوە.

(٢٧) ئاخۆ حاڵیان چۆن بێت کە فریشتەکان لەکاتی گیان کێشانیاندا بەدەم و چاوو بەرو پشتیاندا دەماڵن.

(٢٨) ئەو سووکایەتی سەرەمەرگە بۆیە بەسەریاندا دێت، چونکە ئەوانە شوێنی ئەو شتانە کەوتبوون کە قین و خەشمی خوا دەبزوێنێت، ئەوانە بێزار بوون لە ڕەزامەندی خوا، خوایش کاروکردەوەیانی پووچ و بێ ئاکام کرد.

(٢٩) ئایا ئەوانەی کە دڵیان نەخۆشی دووڕوویی تیادایە، وایانزانیووە خوا هەرگیز کینە و بوغزی دەروونیان ئاشکرا ناکات؟!

وَلَوْ نَشَآءُ لَأَرَيْنَٰكَهُمْ فَلَعَرَفْتَهُم بِسِيمَٰهُمْ ۚ وَلَتَعْرِفَنَّهُمْ فِى لَحْنِ ٱلْقَوْلِ ۚ وَٱللَّهُ يَعْلَمُ أَعْمَٰلَكُمْ ﴿٣٠﴾ وَلَنَبْلُوَنَّكُمْ حَتَّىٰ نَعْلَمَ ٱلْمُجَٰهِدِينَ مِنكُمْ وَٱلصَّٰبِرِينَ وَنَبْلُوَا۟ أَخْبَارَكُمْ ﴿٣١﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ وَصَدُّوا۟ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ وَشَآقُّوا۟ ٱلرَّسُولَ مِنۢ بَعْدِ مَا تَبَيَّنَ لَهُمُ ٱلْهُدَىٰ لَن يَضُرُّوا۟ ٱللَّهَ شَيْـًٔا وَسَيُحْبِطُ أَعْمَٰلَهُمْ ﴿٣٢﴾



۞ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ أَطِيعُوا۟ ٱللَّهَ وَأَطِيعُوا۟ ٱلرَّسُولَ وَلَا تُبْطِلُوٓا۟ أَعْمَٰلَكُمْ ﴿٣٣﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ وَصَدُّوا۟ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ ثُمَّ مَاتُوا۟ وَهُمْ كُفَّارٌ فَلَن يَغْفِرَ ٱللَّهُ لَهُمْ ﴿٣٤﴾ فَلَا تَهِنُوا۟ وَتَدْعُوٓا۟ إِلَى ٱلسَّلْمِ وَأَنتُمُ ٱلْأَعْلَوْنَ وَٱللَّهُ مَعَكُمْ وَلَن يَتِرَكُمْ أَعْمَٰلَكُمْ ﴿٣٥﴾ إِنَّمَا ٱلْحَيَوٰةُ ٱلدُّنْيَا لَعِبٌ وَلَهْوٌ ۚ وَإِن تُؤْمِنُوا۟ وَتَتَّقُوا۟ يُؤْتِكُمْ أُجُورَكُمْ وَلَا يَسْـَٔلْكُمْ أَمْوَٰلَكُمْ ﴿٣٦﴾ إِن يَسْـَٔلْكُمُوهَا فَيُحْفِكُمْ تَبْخَلُوا۟ وَيُخْرِجْ أَضْغَٰنَكُمْ ﴿٣٧﴾ هَٰٓأَنتُمْ هَٰٓؤُلَآءِ تُدْعَوْنَ لِتُنفِقُوا۟ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ فَمِنكُم مَّن يَبْخَلُ ۖ وَمَن يَبْخَلْ فَإِنَّمَا يَبْخَلُ عَن نَّفْسِهِۦ ۚ وَٱللَّهُ ٱلْغَنِىُّ وَأَنتُمُ ٱلْفُقَرَآءُ ۚ وَإِن تَتَوَلَّوْا۟ يَسْتَبْدِلْ قَوْمًا غَيْرَكُمْ ثُمَّ لَا يَكُونُوٓا۟ أَمْثَٰلَكُم ﴿٣٨﴾

(٣٠) خۆ ئەگەر بمانویستایە ئەوانەمان پیشان دەدایت، ئەوکاتە بەروالّەت دەتناسینەوە، سوێند بەخوا لە شێواز و ناوەرۆکی قسە و گوفتاریاندا دەیانناسیتەوە، خوا خۆیشی ئاگا و زانایە بە کاروکردەوەکانتان.

(٣١) سوێند بە خوا ئێمە دەتانخەینە بەر تاقیکردنەوە، تا لە جیهانی واقعدا تێکۆشەر و خۆگرانتان دەربکەوێت و ئاشکرا ببێت بۆمان، بۆ ئەوەش هەواڵی چالاکی ئێوەمان بێتە دەست.

(٣٢) بەڕاستی ئەوانەی کە بێباوەڕن و ڕێگە لە بڵاوکردنەوەی پەیامی خوا دەگرن و دژایەتی ڕێبازی پێغەمبەر ﷺ دەکەن، دوای ئەوەی ڕێبازی هیدایەت و ڕاستیان بۆ ڕوون بۆتەوە، ئا ئەوانە هەرگیز ناتوانن زیان بەخواو ئاینی خوا بگەیەنن.. خوای گەورەش لە ئایندەیەکی نزیکدا هەموو کاروکردەوەو پیلانیان پووچەڵ دەکاتەوە.

(٣٣) ئەی ئەو کەسانەی ئیمان و باوەڕتان هێناوە! گوێڕایەڵی فەرمانی خواو فەرمانی پێغەمبەر بن، کاروکردەوە چاکەکانتان پووچ و بێ نرخ مەکەن، (بە ڕووپامایی وخۆ بە زل زانین و پەشیمان بونەوە لەخێر ومنەت کردن و...هتد)

(٣٤) بەڕاستی ئەوانەی کە بێباوەڕ بوون و بەربەست و کۆسپیان دەخستە بەردەم ڕێبازی خوا، پاشان مردن لەکاتێکدا کە کافر بوون، ئەوە هەرگیز خوا لێیان خۆش نابێت و چاوپۆشیان لێ ناکات.

(٣٥) ئێوە سستی مەکەن و داوای ئاشتی پێش وەخت لە دوژمنان مەکەن، چونکە هەر ئێوە سەرکەوتوو دەبن، دڵنیابن کە خوایش لەگەڵتانە، کاروکردەوەتان بەزایە نادات و لێی کەم ناکاتەوە.

(٣٦) بەڕاستی ژیانی دنیا تەنها بریتیە لە یاری و گەمەیەکی تەمەن کورتا، جا ئەگەر باوەڕ بهێنن و پارێزکاربن، ئەوە خوا بەچاکی پاداشتتان دەداتەوە، خوایش وەنەبێت داوای بەخشینی هەموو سامانتان لێ بکات.

(٣٧) خۆ ئەگەر خوا داوای بەخشینی هەموو سامانتان لێ بکات و ئەرکێکی گران بخاتە سەرتان، ئەوە ڕەزیل و بەرچاو تەنگ دەبن، هەموو ڕق و کینەیەکتان دەردەخات.

(٣٨) ئا ئەوەتە ئێوە بانگ دەکرێن تا بەخشینتان هەبێت لە پێناوی خوادا، کەچی هەتانە ڕەزیل و بەرچاو تەنگە، خۆ ئەوەی ڕەزیل و بەرچاو تەنگی هەبێت، ئەوە بێگومان هەر ڕەزیلی لە خۆی دەکات و زەرەر لە خۆی دەدات، چونکە هەر خوا خۆی دەوڵەمەندو بێنیازە، هەر ئێوەن هەژارو نەدارو کەم دەست و بە نیاز، جا ئەگەر ئێوە پشت هەڵکەن لەم دین و بەرنامەیە، خوا کەسانی چاکتر لە ئێوە دەهێنێتە مەیدان، کە بە هیچ شێوەیەک لە ئێوە ناچن وەک ئێوە نابن.

سُورَةُ الفَتْح

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

إِنَّا فَتَحْنَا لَكَ فَتْحًا مُّبِينًا ﴿١﴾ لِّيَغْفِرَ لَكَ اللَّهُ مَا تَقَدَّمَ مِن ذَنبِكَ وَمَا تَأَخَّرَ وَيُتِمَّ نِعْمَتَهُ عَلَيْكَ وَيَهْدِيَكَ صِرَاطًا مُّسْتَقِيمًا ﴿٢﴾ وَيَنصُرَكَ اللَّهُ نَصْرًا عَزِيزًا ﴿٣﴾ هُوَ الَّذِي أَنزَلَ السَّكِينَةَ فِي قُلُوبِ الْمُؤْمِنِينَ لِيَزْدَادُوا إِيمَانًا مَّعَ إِيمَانِهِمْ ۗ وَلِلَّهِ جُنُودُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ ۚ وَكَانَ اللَّهُ عَلِيمًا حَكِيمًا ﴿٤﴾ لِّيُدْخِلَ الْمُؤْمِنِينَ وَالْمُؤْمِنَاتِ جَنَّاتٍ تَجْرِي مِن تَحْتِهَا الْأَنْهَارُ خَالِدِينَ فِيهَا وَيُكَفِّرَ عَنْهُمْ سَيِّئَاتِهِمْ ۚ وَكَانَ ذَٰلِكَ عِندَ اللَّهِ فَوْزًا عَظِيمًا ﴿٥﴾ وَيُعَذِّبَ الْمُنَافِقِينَ وَالْمُنَافِقَاتِ وَالْمُشْرِكِينَ وَالْمُشْرِكَاتِ الظَّانِّينَ بِاللَّهِ ظَنَّ السَّوْءِ ۚ عَلَيْهِمْ دَائِرَةُ السَّوْءِ ۖ وَغَضِبَ اللَّهُ عَلَيْهِمْ وَلَعَنَهُمْ وَأَعَدَّ لَهُمْ جَهَنَّمَ ۖ وَسَاءَتْ مَصِيرًا ﴿٦﴾ وَلِلَّهِ جُنُودُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ ۚ وَكَانَ اللَّهُ عَزِيزًا حَكِيمًا ﴿٧﴾ إِنَّا أَرْسَلْنَاكَ شَاهِدًا وَمُبَشِّرًا وَنَذِيرًا ﴿٨﴾ لِّتُؤْمِنُوا بِاللَّهِ وَرَسُولِهِ وَتُعَزِّرُوهُ وَتُوَقِّرُوهُ وَتُسَبِّحُوهُ بُكْرَةً وَأَصِيلًا ﴿٩﴾

سوورەتی (الفتح)

بەناوی خوای بەخشندە و میهرەبان

(١) ئەی پێغەمبەرﷺ بەراستی ئێمە سەرکەوتنێکی ئاشکرامان پێبەخشیت(مەبەست ڕێکەوتنەکەی - حودەیبیە - یە کە لە نێوان پێغەمبەرو ﷺ قورەیشدا مۆرکرا، بەندەکانی ئەو پەیمانە لە ڕواڵەتدا زەرەری ئیمانداران بوو، بەڵام هەر هەمووی گەڕا بەخێرو سەربەرزی بۆیان).

(٢) تا خوا لە هەموو گوناهانی رابوردوو ئایندەشت خۆش ببێت و بەخشینەکانی لە سەرت تەواو بکات و بتخاتە سەر ڕێگەی ڕاست و دروست.

(٣) تا بەو بۆنەیەوە خوا سەرکەوتنێکی بەهێزو باڵات پێ ببەخشێت.

(٤) هەر ئەو خوایە خۆی ئارامی و هێمنی دابەزاندۆتە سەر دڵی ئیمانداران، بۆ ئەوەی کە ئیمانیان دامەزراوترو پتەوتر بکات، سەرەڕای ئیمانداری و خواناسیان ئیمانیان زیاد ببێت، بێگومان هەرچی سەربازانی ئاسمانەکان و زەوی هەیە هەر خوا خۆی خاوەنیانە، هەمیشە و بەردەوام خوای گەورە زانایە بە هەموو شتێک و دانایە لە هەموو کارێکدا.

(٥) ئەمەش هەمووی بۆ ئەوەی؛ تا ئیمانداران لە پیاوان و لە ئافرەتان بخاتە ناو بەهەشتێکەوە کە چەندەها ڕووبار بەژێر درەخت و بەبەردەم کۆشک و تەلارەکانیدا دەڕوات، هاوڕێ لەگەڵ ژیانی نەمریدا، هەروەها بۆ ئەوەی کە چاوپۆشی لە هەڵە و گوناهەکانیان بکات و ئەم بەڵێنە لە لایەن خواوە دەستکەوت و سەرفرازیەکی زۆر گەورە و بێ سنوورە بۆ ئیمانداران...

(٦) لەو لاشەوە ئازار و ئەشکەنجەی دووڕو و موشریکەکان، چ پیاوانیان، چ ئافرەتانیان بدات، ئەوانەی کە تێکڕا گومانی خراپیان دەربارەی خوا هەیە، ئەو گومانە خراپەیان هەر بۆخۆیان دەگەڕێتەوە، ئەوانە خوا نەفرینی لێکردوون و دۆزەخی بۆ ئامادەکردوون، ئای کە سەرەنجامێکی یەکجار سەخت و سامناکە.

(٧) هەرچی سەربازان هەیە لە ئاسمانەکان و زەویدا، هەر خوا خۆی خاوەنیانە و لە ژێر فەرمانی ئەودان، هەمیشە و بەردەوام ئەو خوایە باڵادەست و دانایە.

(٨) ئێمە تۆمان ڕەوانەکردووە ئەی محمدﷺ کە شایەت و مژدەدەر و بە ئاگاهێنەر بیت بۆ گرۆی ئادەمیزاد.

(٩) بۆ ئەوەی ئێوە باوەڕ بهێنن بە خواو پێغەمبەرەکەی و پشتیوانی لە پێغەمبەر بکەن و ڕێزی شایستەی خۆی لێ بگرن و تەسبیحات و ستایشی خوا بکەن لە بەرەبەیان و عەسراندا.

إِنَّ ٱلَّذِينَ يُبَايِعُونَكَ إِنَّمَا يُبَايِعُونَ ٱللَّهَ يَدُ ٱللَّهِ فَوْقَ أَيْدِيهِمْ ۚ فَمَن نَّكَثَ فَإِنَّمَا يَنكُثُ عَلَىٰ نَفْسِهِۦ ۖ وَمَنْ أَوْفَىٰ بِمَا عَٰهَدَ عَلَيْهُ ٱللَّهَ فَسَيُؤْتِيهِ أَجْرًا عَظِيمًا ﴿١٠﴾ سَيَقُولُ لَكَ ٱلْمُخَلَّفُونَ مِنَ ٱلْأَعْرَابِ شَغَلَتْنَآ أَمْوَٰلُنَا وَأَهْلُونَا فَٱسْتَغْفِرْ لَنَا ۚ يَقُولُونَ بِأَلْسِنَتِهِم مَّا لَيْسَ فِى قُلُوبِهِمْ ۚ قُلْ فَمَن يَمْلِكُ لَكُم مِّنَ ٱللَّهِ شَيْـًٔا إِنْ أَرَادَ بِكُمْ ضَرًّا أَوْ أَرَادَ بِكُمْ نَفْعًۢا ۚ بَلْ كَانَ ٱللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرًۢا ﴿١١﴾ بَلْ ظَنَنتُمْ أَن لَّن يَنقَلِبَ ٱلرَّسُولُ وَٱلْمُؤْمِنُونَ إِلَىٰٓ أَهْلِيهِمْ أَبَدًا وَزُيِّنَ ذَٰلِكَ فِى قُلُوبِكُمْ وَظَنَنتُمْ ظَنَّ ٱلسَّوْءِ وَكُنتُمْ قَوْمًۢا بُورًا ﴿١٢﴾ وَمَن لَّمْ يُؤْمِنۢ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ فَإِنَّآ أَعْتَدْنَا لِلْكَٰفِرِينَ سَعِيرًا ﴿١٣﴾ وَلِلَّهِ مُلْكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۚ يَغْفِرُ لِمَن يَشَآءُ وَيُعَذِّبُ مَن يَشَآءُ ۚ وَكَانَ ٱللَّهُ غَفُورًا رَّحِيمًا ﴿١٤﴾ سَيَقُولُ ٱلْمُخَلَّفُونَ إِذَا ٱنطَلَقْتُمْ إِلَىٰ مَغَانِمَ لِتَأْخُذُوهَا ذَرُونَا نَتَّبِعْكُمْ ۖ يُرِيدُونَ أَن يُبَدِّلُوا۟ كَلَٰمَ ٱللَّهِ ۚ قُل لَّن تَتَّبِعُونَا كَذَٰلِكُمْ قَالَ ٱللَّهُ مِن قَبْلُ ۖ فَسَيَقُولُونَ بَلْ تَحْسُدُونَنَا ۚ بَلْ كَانُوا۟ لَا يَفْقَهُونَ إِلَّا قَلِيلًا ﴿١٥﴾

(١٠) بێگومـان ئەوانـەی پـەیمان دەدەن بـە تـۆ ئەی محمد ﷺ لەڕاسـتیدا هـەر پـەیمان بـە خـوا دەدەن.. دەسـتی پـیرۆزو بـە تـوانـای خـوا لەسـەر دەسـتیانەوەیە (بـە پشـتگیری و یارمـەتی) جـا ئەوەی پەیمانەکـە بشـکێنێت و لێـی پاشـگەز ببێـتەوە، ئەوە لەسەر خۆی دەکەوێت، ئەوەش کە پەیمانەکە دەباتە سەر و پاشگەز نابێـتـەوە لێـی، خـوای بالادەسـت ئـەجرو پاداشـتی گـەورەی پێدەبەخشێت( لە ئاییندەدا).

(١١) ئـەو عـەرەبـە کـۆچـەریانـەی لـە ڕێکەوتنەکەی حودەیبیە بە جێـمان و بەشداریان نەکرد کاتێک زانیان ئێوە بەرەو غـەزای خەیبەر دەڕۆن کـە خـوا بـەڵێـنی سـەرکەوتن و دەسکەوتەکانی جەنگی پێدابـوون دێـن بـۆلات و دەڵێن: ماڵ ومنداڵمان ئێمەی سەرقاڵ و خەریک کرد و کاتمان نەبوو بێین لەگەڵتان، لەبـەر ئـەوە داوای لێخۆش بوونمان بۆ بکەن لای خوا، ئەوەی بە زمان دەیڵێـن لـە دڵـیـاندا نیـیـە، پێیـان بڵێ: باشـە، کێ دەتـوانێـت بـەری دەسـەڵاتی خـوا بگرێت، ئەگەر بیەوێت زیانێکتان پـێ بگەیـەنێت یان سوودو قازانجێکتان بـۆ پێـش بـهێنێت، خـۆ خوا بەتەواوی بە ئاگایە لە کاروکردەوەکانتان .

(١٢) نەخێر پاساوو بەهانەکەتان وانییە، بەڵکو لە ڕاستیدا ئێوە واگومانتان دەبرد ئیـتر هـەرگیز پێغەمبەرو باوەڕداران ناگەڕێنەوە بۆ ناو کەسوکاریان و تیادەچن، ئەو گومان بردنە لە دڵ و دەروونتاندا رازاێـنرابوو و چەسپی بوو، بەڕاستی گومانی خراپ و ناڕەوایتان بردبوو، ئێوە هەمیشە هۆزو تاقمێکی بێکەڵک و بێ خێرن.

(١٣) هەرکەس باوەڕی بەخواو بە پێغەمبەری خوا نەبێت (ئاییندەی سـامناکە) بەڕاستی ئێمـە سزای دۆزەخـمان بـۆ کافرو بێباوەڕان ئامادە کردووە.

(١٤) هەرچی لە ئاسمانەکان و زەویدا هەیە هەر خوا خۆی خاوەنیانە، لە هەرکەسێک کـە بیـەوێت خـۆش دەبێت و سزای هەرکەسێک بدات دەیدات. (ئەڵبەتە ویستی خوایش بۆ پاداشت یـان سـزا، لەوپـەڕی دادپەروەریدایـە)، خوایش هەمیشەو بەردەوام لێخۆشبووە و بە ڕەحم و دڵۆڤانە.

(١٥) ئەوانەی خۆیان خستە دواوە و بەشداریان نەکرد لە ڕێکەوتنەکەدا، کاتێک بینیان ئێوە (بـەرەو غـەزای خەیبـەر دەڕۆن) بۆ کۆکردنەوەی دەسکەوتەکان، وتیان: لێمان گەڕێن شوێنتان کەوین... ئەمانە دەیانـەوێت؛ ویسـت و فـەرمانی خوا بگۆڕن، پێیان بڵێ: ئێوە هەرگیز شوێنمان ناکەون .. چونکە خوایش هەروای فەرمووە و پێشتر هـەروا بڕیـاریداوە، کەچی ئەوان دەڵێن: نەخێر خوا ڕێگەی لە ئێمە نەگرتووە، بەڵکو ئێوە حەسـوودیمان پـێ دەبـەن بۆیـە نایـەڵن بەشدار بین، (خوا دەفەرمووێت) نەخێر؛ حەسوودیتان پێ نابەن، بـەڵکو ئەوانـە کـەمێک نـەبێت لـە فـەرمانی خـوا تێناگـەن (تەنها چاویان بڕیوەتە سامان و دەسکەوتە دنیاییەکان).

قُل لِّلْمُخَلَّفِينَ مِنَ الْأَعْرَابِ سَتُدْعَوْنَ إِلَىٰ قَوْمٍ أُولِي بَأْسٍ شَدِيدٍ تُقَاتِلُونَهُمْ أَوْ يُسْلِمُونَ ۖ فَإِن تُطِيعُوا يُؤْتِكُمُ اللَّهُ أَجْرًا حَسَنًا ۖ وَإِن تَتَوَلَّوْا كَمَا تَوَلَّيْتُم مِّن قَبْلُ يُعَذِّبْكُمْ عَذَابًا أَلِيمًا ﴿١٦﴾ لَّيْسَ عَلَى الْأَعْمَىٰ حَرَجٌ وَلَا عَلَى الْأَعْرَجِ حَرَجٌ وَلَا عَلَى الْمَرِيضِ حَرَجٌ ۗ وَمَن يُطِعِ اللَّهَ وَرَسُولَهُ يُدْخِلْهُ جَنَّاتٍ تَجْرِي مِن تَحْتِهَا الْأَنْهَارُ ۖ وَمَن يَتَوَلَّ يُعَذِّبْهُ عَذَابًا أَلِيمًا ﴿١٧﴾ ۞ لَّقَدْ رَضِيَ اللَّهُ عَنِ الْمُؤْمِنِينَ إِذْ يُبَايِعُونَكَ تَحْتَ الشَّجَرَةِ فَعَلِمَ مَا فِي قُلُوبِهِمْ فَأَنزَلَ السَّكِينَةَ عَلَيْهِمْ وَأَثَابَهُمْ فَتْحًا قَرِيبًا ﴿١٨﴾ وَمَغَانِمَ كَثِيرَةً يَأْخُذُونَهَا ۗ وَكَانَ اللَّهُ عَزِيزًا حَكِيمًا ﴿١٩﴾ وَعَدَكُمُ اللَّهُ مَغَانِمَ كَثِيرَةً تَأْخُذُونَهَا فَعَجَّلَ لَكُمْ هَٰذِهِ وَكَفَّ أَيْدِيَ النَّاسِ عَنكُمْ وَلِتَكُونَ آيَةً لِّلْمُؤْمِنِينَ وَيَهْدِيَكُمْ صِرَاطًا مُّسْتَقِيمًا ﴿٢٠﴾ وَأُخْرَىٰ لَمْ تَقْدِرُوا عَلَيْهَا قَدْ أَحَاطَ اللَّهُ بِهَا ۚ وَكَانَ اللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرًا ﴿٢١﴾ وَلَوْ قَاتَلَكُمُ الَّذِينَ كَفَرُوا لَوَلَّوُا الْأَدْبَارَ ثُمَّ لَا يَجِدُونَ وَلِيًّا وَلَا نَصِيرًا ﴿٢٢﴾ سُنَّةَ اللَّهِ الَّتِي قَدْ خَلَتْ مِن قَبْلُ ۖ وَلَن تَجِدَ لِسُنَّةِ اللَّهِ تَبْدِيلًا ﴿٢٣﴾



(١٦) ئـەی محمـد ﷺ بڵـێ: بەوانـەی کـە سەرپێچییان کردووە؛ لە عەرەبە بیابـان نشینەکان: ئێوە لە ئایندەدا بانگ دەکرێـن بۆ جـەنگ لەگـەڵ قەوم و هۆزێکدا کە ئازاو جـەنگاوەرن، ئەوسا یـان دژیـان دەجـەنگن، یـان خۆیـان (لـە ئـەنجامی بیرکردنەوە و تێروانیندا) بەبێ جـەنگ موسـڵمان و تەسلیم دەبن، جا ئەگـەر فەرمانبـەردار بن، خوا پاداشتی چاکتان پێدەبەخشێت، بەڵام ئەگـەر پشت هەڵکەن وەکو ئەوسا و خۆتان بشارنەوە و سەرپێچی بکەن، سزایەکی بە ئێشتان بۆ پێش دەهێنێت.

(١٧) ئەو کەسەی کوێرە یان شـەلە یـان نەخۆشـە، گوناهبـار نـابێت (ئەگـەر لـە غـەزادا بەشـداری نـەکات) ئـەوەی کـە فەرمانبـەرداری خـواو پێغەمبەرەکـەی بکـات، دەیخاتــە باخــەکانی بەهەشـتەوە کـە چەندەها رووبـار بـەژێر درەخـت و کۆشکەکانیدا دەڕوات، ئـەو کەســەش کـە پشـت هەڵکات، خـوای گـەورە سـزای بـە ئێـش و ئـازاری دەدات.

(١٨) سوێند بەخوا بەڕاستی خوا رازیی بـووە لـەو باوەڕدارانەی کاتێک پەیمانیان لەگەڵدا بەستیت لە ژێر درەختەکەدا خوا خۆیشی ئاگادار بوو بەوەی لـە دڵەکانیاندا هەیە (لە نیاز پـاکی و دڵسـۆزی) هـەر بۆیە ئارامی وهێمنی وئاسودەیی دابەزاندە سـەریان و پاداشتی بەمژدەی سەرکەوتنێکی نزیک دانەوە.

(١٩) هەروەها بـەڵێنی چـەندین دەسکەوتی زۆری پێدان، کە لە ئایندەدا دەستیان دەکەوێت و وەری دەگرن، خوا هەمیشەو بەردەوام باڵادەستە بەسـەر خوانەناسانداو دانایـە و دەزانێت چ کاتێک ئیمانداران سەر دەخات.

(٢٠) خوا بەڵێنی دەسکەوتی زۆری پێداون، لە ئایندەدا دەستتان دەکەوێت و وەری دەگـرن، بـەڵام جـاری ئێستا هەرئـەوەی پێ بەخشیوون (مەبەست دەسکەوتەکانی خەیبەرە) دەستی خەڵکیشی لێ کۆتـاکردن (مەبەسـت قوڕەیشـە کـە بـەهۆی رێکەوتنەکەی حودەیبییەوە خوای گەورە لە بەگژاچوونی موسڵمانان دەستی بەسـتنەوە)، تـا ئـەم دەستکەوت و سـەرکەوتنە ببێتە نیشانە و بەڵگەیەکی بەهێز بۆ ئیمانداران (کە خوا یارو یاوەرو پشتیوانیانە) هـەروەها رێنموویتـان بکـات بـۆ رێبـازی راست و دروست (لە بەرەو پێش بردنی بانگەوازدا).

(٢١) چەندین دەسـتکەوتی تریشـتان هەیـە کـە ئێسـتا دەسـتتان بەسـەریدا نەڕۆیشـتووە، بەڕاسـتی خـوا خـۆی چـاک بـەو دەسکەوتانە دەزانێت کە بەڕێوەیە بۆتان، هەمیشە و بەردەوام خوا دەسەڵاتی بەسەر هەموو شتێکدا هەیە.

(٢٢) خۆ ئەگەر ئەوانەی بێ باوەڕ بـوون دژی ئێـوە جـەنگیان بـەرپا بکردایـە، ئـەوە دەشـکان و هـەڵدەهاتن، پاشـان دۆست و پشتگیرێکیان نەدەبوو.

(٢٣) (شکست و هەڵاتنی کافران لە جەنگی موسڵماناندا) هەردەم بەرنامە و یاسای خـوا بەڕاسـتی هـەروا بـووە لـە زووەوە، هەرگیز نابینیت بەرنامە و یاسای خوا گۆڕانی بەسەردا بێت.

وَهُوَ ٱلَّذِى كَفَّ أَيْدِيَهُمْ عَنكُمْ وَأَيْدِيَكُمْ عَنْهُم بِبَطْنِ مَكَّةَ مِنۢ بَعْدِ أَنْ أَظْفَرَكُمْ عَلَيْهِمْ ۚ وَكَانَ ٱللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرًا ﴿٢٤﴾ هُمُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ وَصَدُّوكُمْ عَنِ ٱلْمَسْجِدِ ٱلْحَرَامِ وَٱلْهَدْىَ مَعْكُوفًا أَن يَبْلُغَ مَحِلَّهُۥ ۚ وَلَوْلَا رِجَالٌ مُّؤْمِنُونَ وَنِسَآءٌ مُّؤْمِنَٰتٌ لَّمْ تَعْلَمُوهُمْ أَن تَطَـُٔوهُمْ فَتُصِيبَكُم مِّنْهُم مَّعَرَّةٌۢ بِغَيْرِ عِلْمٍ ۖ لِّيُدْخِلَ ٱللَّهُ فِى رَحْمَتِهِۦ مَن يَشَآءُ ۚ لَوْ تَزَيَّلُوا۟ لَعَذَّبْنَا ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ مِنْهُمْ عَذَابًا أَلِيمًا ﴿٢٥﴾ إِذْ جَعَلَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ فِى قُلُوبِهِمُ ٱلْحَمِيَّةَ حَمِيَّةَ ٱلْجَٰهِلِيَّةِ فَأَنزَلَ ٱللَّهُ سَكِينَتَهُۥ عَلَىٰ رَسُولِهِۦ وَعَلَى ٱلْمُؤْمِنِينَ وَأَلْزَمَهُمْ كَلِمَةَ ٱلتَّقْوَىٰ وَكَانُوٓا۟ أَحَقَّ بِهَا وَأَهْلَهَا ۚ وَكَانَ ٱللَّهُ بِكُلِّ شَىْءٍ عَلِيمًا ﴿٢٦﴾ لَّقَدْ صَدَقَ ٱللَّهُ رَسُولَهُ ٱلرُّءْيَا بِٱلْحَقِّ ۖ لَتَدْخُلُنَّ ٱلْمَسْجِدَ ٱلْحَرَامَ إِن شَآءَ ٱللَّهُ ءَامِنِينَ مُحَلِّقِينَ رُءُوسَكُمْ وَمُقَصِّرِينَ لَا تَخَافُونَ ۖ فَعَلِمَ مَا لَمْ تَعْلَمُوا۟ فَجَعَلَ مِن دُونِ ذَٰلِكَ فَتْحًا قَرِيبًا ﴿٢٧﴾ هُوَ ٱلَّذِىٓ أَرْسَلَ رَسُولَهُۥ بِٱلْهُدَىٰ وَدِينِ ٱلْحَقِّ لِيُظْهِرَهُۥ عَلَى ٱلدِّينِ كُلِّهِۦ ۚ وَكَفَىٰ بِٱللَّهِ شَهِيدًا ﴿٢٨﴾

(٢٤) هەر ئەو خوایە دەستی بێ باوەڕانی لە ئێوە بەستەوە (نەیهێشت بەگژتاندا بێن) دەستی ئێوەشی گرتەوە دژیان و (نەیهێشت جەنگ ببێت)، دوای ئەوەی ئێوەی زاڵ کرد بەسەریاندا لەناو جەرگەی مەککەدا، خوا هەمیشە و بەردەوام بینایە بەوەی کە دەیکەن.

(٢٥) ئەو خراپەکارانە ئەوانەن کە بێباوەڕ بوون و ڕێگەشیان لێ گرتن بگەنە کەعبەی پیرۆزو نەیانهێشت ئەو مەڕومالاتەی کە گل درابوونەوە بۆ قوربانی بگاتە جێی خۆی، خۆ ئەگەر لەبەر ئەو پیاوو ئافرەتە موسڵمانانە نەبوایە کە نەتاندەناسین پێشێلتان دەکردن (لەناو شاری مەککەدا بوون و هێشتا کۆچیان نەکردبوو)، بەهۆی ئەوەوە عەیب و عارو باری گرانتان تووش دەبوو لێیانەوە بێ ئەوەی بزانن، (ئەگەر لەبەر ئەوە نەبوایە مۆڵەتی ئێوەمان دەدا بۆ کوشتنیان)، ئەمەش بۆ ئەوەی خوای پەروەردگار ئەو کەسانەی دەیەوێت و شایستەن بخاتە ژێرسایەی سۆزو بەزەیی خۆیەوە، خۆ ئەگەر موسڵمان لە کافران جیابوونایە لە مەککەدا، بێگومان ئێمە بەدەستی ئێوە سزای بەسۆی بێباوەڕانمان دەدا.

(٢٦) سزای ئەوانەی کە بێ باوەڕ بوون لەبەر ئەوەیە دەمارگیریان خستۆتە ناو دڵ و دەروونیی خۆیانەوە، کە دەمارگیریی نەفامی‌یە، جا خوا ئارامی و ئاسوودەیی دابەزاندە سەر پێغەمبەرەکەی و سەر ئیمانداران (ئیتر دڵخۆشن بە ڕێکەوتنەکە و دەرەنجامەکانی) خوای گەورەش پابەندی خواناسی و پارێزکاری کردن، ئەوان شایستەی ئەو بەهرەیەن و مەردی ئەو ڕێزەن.. دڵنیابن هەمیشە و بەردەوام خوا بەهەموو شتێک زانا و ئاگایە.

(٢٧) سوێند بەخوا بێگومان خوا خەونی پێغەمبەرەکەی بەڕاستی و وەک خۆی هێناوەتە دی کە دەفەرموێت: بەم زووانە ئێوە بەهەموو ئارامی و ئاسوودەییەکەوە بەویستی خوا دەچنە ناو کەعبەی پیرۆزەوە، (عەمرە بەجێدەهێنن) سەرتان دەتاشن یان کورتی دەکەنەوە بێ ئەوەی ترس و بیمتان لە کەس هەبێت، جا ئەوەی نەتانزانیوە خوا دەیزانی، کە جگە لەم سەرکەوتنە سەرکەوتنێکی نزیکی تری بۆ بڕیارداون و پێتان دەبەخشێت (کە غەزای خەیبەرە)..

(٢٨) خوا ئەو زاتەیە کە پێغەمبەری خۆی ڕەوانە کردووە هاوڕێ لەگەڵ ڕێنمویی و پەیامی ڕاست و دروستدا، بۆ ئەوەی زاڵی بکات بەسەر هەمـوو پەیـام و بەرنامەیەکی تردا، خوا خۆیشی بەسە؛ بۆ شایەتیدان و ئاشکرا کردنی ئەو ڕاستی‌یە.

مُحَمَّدٌ رَّسُولُ ٱللَّهِ ۚ وَٱلَّذِينَ مَعَهُۥٓ أَشِدَّآءُ عَلَى ٱلْكُفَّارِ رُحَمَآءُ بَيْنَهُمْ ۖ تَرَىٰهُمْ رُكَّعًا سُجَّدًا يَبْتَغُونَ فَضْلًا مِّنَ ٱللَّهِ وَرِضْوَٰنًا ۖ سِيمَاهُمْ فِى وُجُوهِهِم مِّنْ أَثَرِ ٱلسُّجُودِ ۚ ذَٰلِكَ مَثَلُهُمْ فِى ٱلتَّوْرَىٰةِ ۚ وَمَثَلُهُمْ فِى ٱلْإِنجِيلِ كَزَرْعٍ أَخْرَجَ شَطْـَٔهُۥ فَـَٔازَرَهُۥ فَٱسْتَغْلَظَ فَٱسْتَوَىٰ عَلَىٰ سُوقِهِۦ يُعْجِبُ ٱلزُّرَّاعَ لِيَغِيظَ بِهِمُ ٱلْكُفَّارَ ۗ وَعَدَ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّـٰلِحَـٰتِ مِنْهُم مَّغْفِرَةً وَأَجْرًا عَظِيمًۢا ﴿٢٩﴾

سُورَةُ الحُجُرَاتِ

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَـٰنِ ٱلرَّحِيمِ

يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَا تُقَدِّمُوا۟ بَيْنَ يَدَىِ ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ ۖ وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ سَمِيعٌ عَلِيمٌ ﴿١﴾ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَا تَرْفَعُوٓا۟ أَصْوَٰتَكُمْ فَوْقَ صَوْتِ ٱلنَّبِىِّ وَلَا تَجْهَرُوا۟ لَهُۥ بِٱلْقَوْلِ كَجَهْرِ بَعْضِكُمْ لِبَعْضٍ أَن تَحْبَطَ أَعْمَـٰلُكُمْ وَأَنتُمْ لَا تَشْعُرُونَ ﴿٢﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَغُضُّونَ أَصْوَٰتَهُمْ عِندَ رَسُولِ ٱللَّهِ أُو۟لَـٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ ٱمْتَحَنَ ٱللَّهُ قُلُوبَهُمْ لِلتَّقْوَىٰ ۚ لَهُم مَّغْفِرَةٌ وَأَجْرٌ عَظِيمٌ ﴿٣﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ يُنَادُونَكَ مِن وَرَآءِ ٱلْحُجُرَٰتِ أَكْثَرُهُمْ لَا يَعْقِلُونَ ﴿٤﴾

(٢٩) محمد ﷺ رەوانەکراوی خوایە، ئەوانەش کەلە خزمەتیدان و شوێنی کەوتوون توند و تیژن بەرامبەر بێباوەڕان و بەبەزەیی و میهرەبانن لە نێوان خۆیاندا، دەیانبینیت سەرگەرمی نوێژ و خواپەرستین، کڕنوش و سوژدە دەبەن، هەردەم ئاواتیان بەدەستهێنانی ڕەزامەندنی و پایە بەرزییە لە لای خوا، نیشانەی چاکی و پاکییان لە ناوچەوانیاندا دیارەو دەدرەوشێتەوە لە ئەنجامی سوژدە بردن و خوا پەرستییاندا، جا ئەو بەڕێزانە ئەوە نموونە و پێناسەیانە لە تەوراتدا، نموونەو پێناسەشیان لە ئینجلیشدا وەك ڕوەكێك وایە کە لە سەرەتاوە چەکەرە بکات، جا چەکەرەکەی بەهێز کردبێت، پاشان ئەستوور ببێت و ڕابوەستێت لەسەر قەدەکەی، ئەوەندە زوو پێ بگات کشتیارەکان سەرسام بکات و پێیان سەیر بێت: چۆن وا پێگەیی؟! چۆن ئاوا خۆی گرت؟! ئەم پێناسەیە بۆ ئەوەیە خوا کافران داخ لە دڵ بکات، جا خوای بە دەسەلات بەڵێنی بەوانە داوەکە باوەڕیانهێناوە و کردەوە چاکەکانیان ئەنجامداوە لەوان: کە لێخۆشبوون و پاداشتی گەورە و بێسنووریان پێببەخشێت.

سووڕەتی (الحـجـرات)

بەناوی خوای بەخشندە و میهرەبان

(١) ئەی ئەو کەسانەی باوەڕتان هێناوە پێشی خواو پێغەمبەری خوا مەکەون لە بڕیار و پێشنیاردا لە خوا بترسن و پارێزکاربن، چونکە بەڕاستی خوا بیسەرە بە گوفتارتان، زانایە بە نیازو نهێنیەکانتان.

(٢) ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە؛ دەنگتان بەسەر دەنگی پێغەمبەردا ﷺ بەرز مەکەنەوە لەکاتی گفتوگۆدا، قسە بێ پەردە مەکەن لە خزمەتیدا، وەکو بۆ یەکتری دەکەن، نەوەکو کردەوەکانتان پووچ بێتەوە و هەستیشی پێ نەکەن.

(٣) بەڕاستی ئەوانەی کە دەنگیان هێواش دەکەنەوە لە خزمەت پێغەمبەری خوادا، ئەوانە ئەو کەسانەن کە خوای گەورە دڵەکانیانی زاخاوداوە بۆ تەقواو خواناسین، ئەوانە لێ خۆشبوون و پاداشتی گەورە و گرانبەها بۆیان ئامادەیە.

(٤) بەڕاستی ئەوانەی لە دەرەوەی ژوورەکان بانگت لێ دەکەن ؛ ئەوانە زۆربەیان نەفامن و ژیری وەرناگرن (چونکە ڕەوشتی کۆمەلایەتی دروستیان لەو بوارەدا ڕەچاو نەکردووە).

وَلَوْ أَنَّهُمْ صَبَرُوا۟ حَتَّىٰ تَخْرُجَ إِلَيْهِمْ لَكَانَ خَيْرًا لَّهُمْ ۚ وَٱللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿٥﴾ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ إِن جَآءَكُمْ فَاسِقٌۢ بِنَبَإٍ فَتَبَيَّنُوٓا۟ أَن تُصِيبُوا۟ قَوْمًۢا بِجَهَـٰلَةٍ فَتُصْبِحُوا۟ عَلَىٰ مَا فَعَلْتُمْ نَـٰدِمِينَ ﴿٦﴾ وَٱعْلَمُوٓا۟ أَنَّ فِيكُمْ رَسُولَ ٱللَّهِ ۚ لَوْ يُطِيعُكُمْ فِى كَثِيرٍ مِّنَ ٱلْأَمْرِ لَعَنِتُّمْ وَلَـٰكِنَّ ٱللَّهَ حَبَّبَ إِلَيْكُمُ ٱلْإِيمَـٰنَ وَزَيَّنَهُۥ فِى قُلُوبِكُمْ وَكَرَّهَ إِلَيْكُمُ ٱلْكُفْرَ وَٱلْفُسُوقَ وَٱلْعِصْيَانَ ۚ أُو۟لَـٰٓئِكَ هُمُ ٱلرَّٰشِدُونَ ﴿٧﴾ فَضْلًا مِّنَ ٱللَّهِ وَنِعْمَةً ۚ وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ ﴿٨﴾ وَإِن طَآئِفَتَانِ مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ ٱقْتَتَلُوا۟ فَأَصْلِحُوا۟ بَيْنَهُمَا ۖ فَإِنۢ بَغَتْ إِحْدَىٰهُمَا عَلَى ٱلْأُخْرَىٰ فَقَـٰتِلُوا۟ ٱلَّتِى تَبْغِى حَتَّىٰ تَفِىٓءَ إِلَىٰٓ أَمْرِ ٱللَّهِ ۚ فَإِن فَآءَتْ فَأَصْلِحُوا۟ بَيْنَهُمَا بِٱلْعَدْلِ وَأَقْسِطُوٓا۟ ۖ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلْمُقْسِطِينَ ﴿٩﴾ إِنَّمَا ٱلْمُؤْمِنُونَ إِخْوَةٌ فَأَصْلِحُوا۟ بَيْنَ أَخَوَيْكُمْ ۚ وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ لَعَلَّكُمْ تُرْحَمُونَ ﴿١٠﴾ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَا يَسْخَرْ قَوْمٌ مِّن قَوْمٍ عَسَىٰٓ أَن يَكُونُوا۟ خَيْرًا مِّنْهُمْ وَلَا نِسَآءٌ مِّن نِّسَآءٍ عَسَىٰٓ أَن يَكُنَّ خَيْرًا مِّنْهُنَّ ۖ وَلَا تَلْمِزُوٓا۟ أَنفُسَكُمْ وَلَا تَنَابَزُوا۟ بِٱلْأَلْقَـٰبِ ۖ بِئْسَ ٱلِٱسْمُ ٱلْفُسُوقُ بَعْدَ ٱلْإِيمَـٰنِ ۚ وَمَن لَّمْ يَتُبْ فَأُو۟لَـٰٓئِكَ هُمُ ٱلظَّـٰلِمُونَ ﴿١١﴾

(٥) خۆ ئەگەر ئەوانە خۆگربوونایە! تا دەچویتە دەرەوە بۆ لایان، ئەوە چاکتر و رەواتر بوو بۆیان خوا لێخۆشبوو میهرەبانە، (دەکرێت ئەم چوار ئایەتە رێنموویی بێت بۆ سەرجەم ئیمانداران، تا رێزی پێشەواکانیان بگرن).

(٦) ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە ئەگەر کەسێکی متمانە پێنەکراو هەواڵێکی گرنگی بۆ هێنان؛ خێرا بڕوای پێ مەکەن، بەڵکو سەرنج بدەن، لێی بکۆڵنەوە تا بۆتان روون دەبێتەوە، نەوەکو ئازارو ناخۆشی و گیروگرفت بۆ خەڵکی دروست بکەن بە نەزانی، جا دوای پەشیمان ببنەوە لەو کارەی کە پێی هەستاون.

(٧) ئێوە دڵنیابن و بزانن کە پێغەمبەری خوا لەناوتاندایە (پرس و رای پێ بکەن) زۆر شت هەیە ئەگەر ئەو؛ بەرای ئێوەی بکردایە تووشی گیروگرفت و ناخۆشی دەبوون.. بەڵام خوا ئیمان و باوەڕی لە لا خۆشەویست کردوون و لە دڵ و دەروونتاندا رازاندویەتیەوە.. لەو لایشەوە کوفرو بێباوەڕی وگوناهو یاخیبوون لە فەرمانی خوای لا تاڵ و ناشیرین کردوون، ئا ئەوانە هەر خۆیان رێگەی ژیری و سەرفرازیان گرتۆتەبەر.

(٨) ئەمەش خۆی رێزو بەخششێکی تایبەتی و نازو نیعمەتێکە لە لایەن خواوە پێیان دراوە، خوایش زاناو داناو کاربەجێیە.

(٩) ئەگەر دوو دەستە، یان دوو تاقم لە موسوڵمانان بوو بەشەڕیان، ئەوە دەستبەجێ هەوڵ بدەن رێکیان بخەن و ئاشتیان بکەنەوە، خۆ ئەگەر لایەکیان هەر دەستدرێژی دەکردە سەر لاکەی تر، ئەوا ئێوە بەگژ ئەوەیاندا بچن کە ستەم و دەستدرێژی دەکات، هەتا دەگەڕێتەوە بۆ فەرمانی خوا.. جا ئەگەر لایەنە سەرکەشەکە بۆ فەرمانی خوا سەری دانەواند، ئەوە ئێوە ناوبژیوانیەکی دادگەرانە لەنێوانیاندا بکەن و دادپەروەری ئەنجام بدەن، چونکە بەراستی خوا ئەوانەی خۆش دەوێت کە دادپەروەری ئەنجام دەدەن.

(١٠) لەڕاستیدا هەر ئیمانداران برای یەکن، کەواتە هەرکاتێک لە نێوان دوو براتاندا ناکۆکی پەیدا بوو، ئێوە نێوانیان چاک بکەن و ئاشتیان بکەنەوە، هەمیشە لە خوا بترسن و پارێزکار بن، بۆ ئەوەی رەحمتان پێ بکرێت.

(١١) ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە! هیچ کەس و هیچ هۆزێک گاڵتە بەکەس و هۆزێکی تر نەکات و زەلیلی نەکات، چونکە لەوانەیە ئەوان چاکتر بن لەمان، ژنانیش باگاڵتە بەیەک نەکەن و یەکتر زەلیل نەکەن، چونکە لەوانەیە ئەمان لەوان چاکتر بن.. سووکایەتی بەخۆتان مەکەن و یەکتری عەیبدار مەکەن (چونکە سووکایەتی بەیەکتر سووکایەتیە بە خۆتان) هەروەها ناوو ناتۆرەی ناشیرین بۆ یەکتر دامەتاشن، ئای کە چەند ناشیرینە ناوو ناتۆرەی خراپ لە دوای باوەڕهێنان و موسڵمان بوون، ئەوەش تەوبەی نەکردبێت و پەشیمان نەبووێتەوە لە گوناهەکانی، جا ئەو جۆرە کەسانە هەر ستەمکارن.

يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱجْتَنِبُواْ كَثِيرًا مِّنَ ٱلظَّنِّ إِنَّ بَعْضَ ٱلظَّنِّ إِثْمٌ وَلَا تَجَسَّسُواْ وَلَا يَغْتَب بَّعْضُكُم بَعْضًا أَيُحِبُّ أَحَدُكُمْ أَن يَأْكُلَ لَحْمَ أَخِيهِ مَيْتًا فَكَرِهْتُمُوهُ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ إِنَّ ٱللَّهَ تَوَّابٌ رَّحِيمٌ ﴿١٢﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِنَّا خَلَقْنَٰكُم مِّن ذَكَرٍ وَأُنثَىٰ وَجَعَلْنَٰكُمْ شُعُوبًا وَقَبَآئِلَ لِتَعَارَفُوٓاْ إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِندَ ٱللَّهِ أَتْقَىٰكُمْ إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٌ ﴿١٣﴾ ۞ قَالَتِ ٱلْأَعْرَابُ ءَامَنَّا قُل لَّمْ تُؤْمِنُواْ وَلَٰكِن قُولُوٓاْ أَسْلَمْنَا وَلَمَّا يَدْخُلِ ٱلْإِيمَٰنُ فِى قُلُوبِكُمْ وَإِن تُطِيعُواْ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ لَا يَلِتْكُم مِّنْ أَعْمَٰلِكُمْ شَيْـًٔا إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿١٤﴾ إِنَّمَا ٱلْمُؤْمِنُونَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ ثُمَّ لَمْ يَرْتَابُواْ وَجَٰهَدُواْ بِأَمْوَٰلِهِمْ وَأَنفُسِهِمْ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلصَّٰدِقُونَ ﴿١٥﴾ قُلْ أَتُعَلِّمُونَ ٱللَّهَ بِدِينِكُمْ وَٱللَّهُ يَعْلَمُ مَا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِى ٱلْأَرْضِ وَٱللَّهُ بِكُلِّ شَىْءٍ عَلِيمٌ ﴿١٦﴾ يَمُنُّونَ عَلَيْكَ أَنْ أَسْلَمُواْ قُل لَّا تَمُنُّواْ عَلَىَّ إِسْلَٰمَكُم بَلِ ٱللَّهُ يَمُنُّ عَلَيْكُمْ أَنْ هَدَىٰكُمْ لِلْإِيمَٰنِ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ ﴿١٧﴾ إِنَّ ٱللَّهَ يَعْلَمُ غَيْبَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَٱللَّهُ بَصِيرٌ بِمَا تَعْمَلُونَ ﴿١٨﴾



(١٢) ئەی ئەو کەسانەی باوەڕتان هێناوە، خۆتان زۆر بپارێزن لە گومانی خراپ، لەڕاستیدا هەندێ لەو گومانانە گوناهو تاوانن (بۆیە حەق وایە لەهەموو گومانێک خۆپارێزبین)، بە شوێن کەمو کووڕیی و عەیب و عاری یەکتردا مەگەڕێن و سیخوڕی مەکەن و لەپاش ملە باسی یەکتری و ناوی یەکتری بەخراپ مەبەن، ئایا کەستان خۆشی دێت لەوەی گۆشتی برای خۆی بە مردوویی بخوات؟! دیارە کاری واتان زۆر پێ سەخت و ناخۆشە، دەی کەواتە لەخوا بترسن و پارێزکار بن، چونکە بەڕاستی خوا گەڕانەوەی خەڵکی وەردەگرێت و میهرەبانە بۆیان.

(١٣) ئەی خەڵکینە بێگومان ئێمە هەمووتانمان لە نێرو مێیەک دروستکردووە (کە باوکە ئادەم و دایکە حەوایە) و کردوومانن بە چەندەها گەل و تیرە و هۆزی جۆربەجۆر، تا یەکتر بناسن و پەیوەندیتان خۆش بێت بە یەکەوە.. بەڕاستی بەڕێزترینتان لای خوا ئەو کەسانەتانە کە زۆرتر لە خواترسە و فەرمانبەرداری خوایە، بێگومان خوا زاناو ئاگایە بەهەمووان.

(١٤) هەندێک لە بیابان نشینە عەرەبەکان وتیان: باوەڕمان هێناوە و موسڵمانین، پێیان بڵێ: نەخێر، باوەڕتان نەهێناوە، بەڵام بڵێن: بە ناچاری موسوڵمان بووین، هێشتا باوەڕ نەچۆتە ناو دڵەکانتانەوە و تیایدا جێگیر نەبووە (چاوەڕێ دەکرێت کە باوەڕ بهێنن)، خۆ ئەگەر بەڕاستی ئێوە گوێڕایەڵی فەرمانی خواو پێغەمبەری خوا بن، ئەوە خوای گەورە لە پاداشتی چاکەکانتان هیچ کەم ناکاتەوە، چونکە بەڕاستی خوا لێخۆشبوو میهرەبانە.

(١٥) بێگومان ئیماندارانی راست ئەوانەن کە باوەڕیان بەخواو پێغەمبەری خوا هێناوە و پاشان نەکەوتوونەتە هیچ گومان و دوودڵیەکەوە، بەخۆیان و سەرو ماڵیشیانەوە تێکۆشاون لە پێناوی ئاینی خوادا، تەنها ئا ئەوانە راستن.

(١٦) ئەی محمد ﷺ بڵێ: ئایا ئێوە خوای گەورە لە ئاینی خۆتان ئاگادار دەکەن و پێی رادەگەیەنن، لە حاڵێکدا خوا زانایە بە هەرچی لە ئاسمانەکان و زەویدا هەیە، خوا بە هەموو شتێک زاناو ئاگادارە؟!

(١٧) ئەوانە منەت دەکەن بەسەر تۆدا کە گوایە موسڵمان بوون، پێیان بڵێ: منەت مەکەن بەسەرمدا لەسەر موسڵمان بوونەکەتان، بەڵکو خوا منەت دەکات بەسەر ئێوەدا کە هیدایەتی داون بۆ ئیمان و باوەڕ ئەگەر ئێوە راستگۆن.

(١٨) بێگومان خوا نهێنی و شاراوەکانی ئاسمان و زەوی دەزانێت، هەروەها خوای گەورە بینایە بە هەموو ئەو کردەوانەی کە ئەنجامی دەدەن.

سوورەتی ( ق )

بەناوی خوای بەخشندە و میهرەبان

سُورَةُ قٓ

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

قٓ وَالْقُرْءَانِ الْمَجِيدِ ﴿١﴾ بَلْ عَجِبُوٓا۟ أَن جَآءَهُم مُّنذِرٌ مِّنْهُمْ فَقَالَ الْكَٰفِرُونَ هَٰذَا شَىْءٌ عَجِيبٌ ﴿٢﴾ أَءِذَا مِتْنَا وَكُنَّا تُرَابًا ذَٰلِكَ رَجْعٌۢ بَعِيدٌ ﴿٣﴾ قَدْ عَلِمْنَا مَا تَنقُصُ الْأَرْضُ مِنْهُمْ وَعِندَنَا كِتَٰبٌ حَفِيظٌۢ ﴿٤﴾ بَلْ كَذَّبُوا۟ بِالْحَقِّ لَمَّا جَآءَهُمْ فَهُمْ فِىٓ أَمْرٍ مَّرِيجٍ ﴿٥﴾ أَفَلَمْ يَنظُرُوٓا۟ إِلَى السَّمَآءِ فَوْقَهُمْ كَيْفَ بَنَيْنَٰهَا وَزَيَّنَّٰهَا وَمَا لَهَا مِن فُرُوجٍ ﴿٦﴾ وَالْأَرْضَ مَدَدْنَٰهَا وَأَلْقَيْنَا فِيهَا رَوَٰسِىَ وَأَنۢبَتْنَا فِيهَا مِن كُلِّ زَوْجٍۭ بَهِيجٍ ﴿٧﴾ تَبْصِرَةً وَذِكْرَىٰ لِكُلِّ عَبْدٍ مُّنِيبٍ ﴿٨﴾ وَنَزَّلْنَا مِنَ السَّمَآءِ مَآءً مُّبَٰرَكًا فَأَنۢبَتْنَا بِهِۦ جَنَّٰتٍ وَحَبَّ الْحَصِيدِ ﴿٩﴾ وَالنَّخْلَ بَاسِقَٰتٍ لَّهَا طَلْعٌ نَّضِيدٌ ﴿١٠﴾ رِّزْقًا لِّلْعِبَادِ وَأَحْيَيْنَا بِهِۦ بَلْدَةً مَّيْتًا كَذَٰلِكَ الْخُرُوجُ ﴿١١﴾ كَذَّبَتْ قَبْلَهُمْ قَوْمُ نُوحٍ وَأَصْحَٰبُ الرَّسِّ وَثَمُودُ ﴿١٢﴾ وَعَادٌ وَفِرْعَوْنُ وَإِخْوَٰنُ لُوطٍ ﴿١٣﴾ وَأَصْحَٰبُ الْأَيْكَةِ وَقَوْمُ تُبَّعٍ كُلٌّ كَذَّبَ الرُّسُلَ فَحَقَّ وَعِيدِ ﴿١٤﴾ أَفَعَيِينَا بِالْخَلْقِ الْأَوَّلِ بَلْ هُمْ فِى لَبْسٍ مِّنْ خَلْقٍ جَدِيدٍ ﴿١٥﴾

(١) سەرنجی ئایەتی ١ لاپەڕە ٤٨٣ بدە، سوێند بەم قورئانە کە خاوەنی ڕێز و شکۆمەندییە (تۆ ئەی محمد ﷺ نێردراوی لەلایەن خواوە).

(٢) خەڵکی، باوەڕیان نەکرد، بەڵکو سەرسام بوون لەوەی کە یەکێک لەخۆیان نێردراوە تا دایان بچڵەکێنێت وبێداریان بکاتەوە، جا کافران وتیان: ئەمە شتێکی سەیرو سەرسوڕهێنەرە، بۆیە وتیان:

(٣) ئایا کاتێک مردین و بووینە خاک زیندوو دەبینەوە؟! دوای مردن گەڕانەوە ئەستەمە! (پەروەردگاریش لە وەڵامیاندا دەفەرموێت):

(٤) بەراستی ئێمە زانیوومانە کاتێک کە مردن، زەوی چۆن بەرەبەرە لاشەیان دادەڕزێنێت و دەیکاتەوە بە خاک، ئێمە تۆمارگەی تایبەتیمان هەیە، کە هەموو شتێکی تێدا تۆمارە و هیچ شتێک لەبارەی ئەوانەوە لە ئێمە شاراوەو بزر نیە.

(٥) بەڵام ئەمانە دژی ڕاستین و بڕوایان پێ نەهێناوە کاتێک بۆیان هات، بەهۆی ئەوەوە ئەوانە لە سەرگەردانی و سەرلێشێواوییەکی ئاڵۆزدا دەژین (هەر ڕۆژەی قسەیەک دەکەن).

(٦) ئایا ورد نەبوونەتەوە لەو ئاسمانەی کە بە ڕاسەریانەوەیە: چۆنمان دروست کردووە و ڕازاندوومانەتەوە بەجۆرێک هیچ کەم و کووڕی و کەلێنێکی تێدا نییە؟!

(٧) هەروەها زەویمان ڕاخستووە و بڵاومان کردۆتەوە و کەژو کێومان لەسەری دامەزراندووە و لە هەموو جۆرە ڕوەکێکی جوان و ڕازاوەمان تیادا ڕواندووە.

(٨) ئەمانە هەر هەمووی بۆ ڕۆشنکردنەوەی دڵ و یادخستنەوەیە بۆ هەموو ئەو بەندانەی کە بەلای ئێمەدا دێنەوە و ڕەزامەندی ئێمەیان مەبەستە.

(٩) لە ئاسمانەوە ئاوێکی بە پیت و بەرەکەتمان هەردەم دابەزاندووە جا بەهۆی ئەوەوە چەندەها باخ و دانەوێڵەی ئەو کشتوکاڵانەی کە درەو دەکرێن ئەروێنین.

(١٠) هەروەها دارخورمای قەشەنگ و بڵند سەری هەڵدا، کە هێشووە خورمای جوان و لەسەر یەک و ڕیزکراو دەگرێت.

(١١) ئەمەش بۆ ئەوەی ببێتە ڕزق و ڕۆزی بۆ بەندەکان.. هەر بەو ئاوو بارانە شوێنە مردووەکان زیندوودەکەینەوە، هەر ئاوەهایش لە دوای مردن ئێوە لەخاک دێنە دەرەوە.

(١٢) پێش ئەمانیش، قەومی نوح، پێغەمبەرەکەیان بە درۆزانی.. هەروەها خاوەن بیرەکان و هۆزی ثمود یش.

(١٣) هەروەها قەومی هود و فیرعەون و براکانی لوط، (واتە: قەومەکەی).

(١٤) خاوەن باخە چڕەکان و قەومەکەی ـ تبع ـ یش، (کە یەکێک بووە لە پاشاکانی دەوڵەتی حمیەری لە یەمەن) ..هەر یەکێک لەوان باوەڕیان بە پێغەمبەرەکانیان نەکرد، بەهۆی ئەوەوە شایستەی پێشهاتنی هەڕەشەی ئێمە بوون.

(١٥) ئایا ئێمە لە سەرەتا و یەکەم جاردا کە ئەو خەڵکەمان دروست کرد ماندوو بووین و گیروگرفت هاتە ڕێمان؟! نەخێر ماندوو نەبووین، بەڵکو ئەوان لە گوماندان بەرامبەر بە دروست بوونەوەیەکی تازە.

وَلَقَدْ خَلَقْنَا ٱلْإِنسَٰنَ وَنَعْلَمُ مَا تُوَسْوِسُ بِهِۦ نَفْسُهُۥ ۖ وَنَحْنُ أَقْرَبُ إِلَيْهِ مِنْ حَبْلِ ٱلْوَرِيدِ ﴿١٦﴾ إِذْ يَتَلَقَّى ٱلْمُتَلَقِّيَانِ عَنِ ٱلْيَمِينِ وَعَنِ ٱلشِّمَالِ قَعِيدٌ ﴿١٧﴾ مَّا يَلْفِظُ مِن قَوْلٍ إِلَّا لَدَيْهِ رَقِيبٌ عَتِيدٌ ﴿١٨﴾ وَجَآءَتْ سَكْرَةُ ٱلْمَوْتِ بِٱلْحَقِّ ۖ ذَٰلِكَ مَا كُنتَ مِنْهُ تَحِيدُ ﴿١٩﴾ وَنُفِخَ فِى ٱلصُّورِ ۚ ذَٰلِكَ يَوْمُ ٱلْوَعِيدِ ﴿٢٠﴾ وَجَآءَتْ كُلُّ نَفْسٍ مَّعَهَا سَآئِقٌ وَشَهِيدٌ ﴿٢١﴾ لَّقَدْ كُنتَ فِى غَفْلَةٍ مِّنْ هَٰذَا فَكَشَفْنَا عَنكَ غِطَآءَكَ فَبَصَرُكَ ٱلْيَوْمَ حَدِيدٌ ﴿٢٢﴾ وَقَالَ قَرِينُهُۥ هَٰذَا مَا لَدَىَّ عَتِيدٌ ﴿٢٣﴾ أَلْقِيَا فِى جَهَنَّمَ كُلَّ كَفَّارٍ عَنِيدٍ ﴿٢٤﴾ مَّنَّاعٍ لِّلْخَيْرِ مُعْتَدٍ مُّرِيبٍ ﴿٢٥﴾ ٱلَّذِى جَعَلَ مَعَ ٱللَّهِ إِلَٰهًا ءَاخَرَ فَأَلْقِيَاهُ فِى ٱلْعَذَابِ ٱلشَّدِيدِ ﴿٢٦﴾ ۞ قَالَ قَرِينُهُۥ رَبَّنَا مَآ أَطْغَيْتُهُۥ وَلَٰكِن كَانَ فِى ضَلَٰلٍۭ بَعِيدٍ ﴿٢٧﴾ قَالَ لَا تَخْتَصِمُوا۟ لَدَىَّ وَقَدْ قَدَّمْتُ إِلَيْكُم بِٱلْوَعِيدِ ﴿٢٨﴾ مَا يُبَدَّلُ ٱلْقَوْلُ لَدَىَّ وَمَآ أَنَا۠ بِظَلَّٰمٍ لِّلْعَبِيدِ ﴿٢٩﴾ يَوْمَ نَقُولُ لِجَهَنَّمَ هَلِ ٱمْتَلَأْتِ وَتَقُولُ هَلْ مِن مَّزِيدٍ ﴿٣٠﴾ وَأُزْلِفَتِ ٱلْجَنَّةُ لِلْمُتَّقِينَ غَيْرَ بَعِيدٍ ﴿٣١﴾ هَٰذَا مَا تُوعَدُونَ لِكُلِّ أَوَّابٍ حَفِيظٍ ﴿٣٢﴾ مَّنْ خَشِىَ ٱلرَّحْمَٰنَ بِٱلْغَيْبِ وَجَآءَ بِقَلْبٍ مُّنِيبٍ ﴿٣٣﴾ ٱدْخُلُوهَا بِسَلَٰمٍ ۖ ذَٰلِكَ يَوْمُ ٱلْخُلُودِ ﴿٣٤﴾ لَهُم مَّا يَشَآءُونَ فِيهَا وَلَدَيْنَا مَزِيدٌ ﴿٣٥﴾



سوێند بەخوا بێگومان ئێمە ئادەمیزادمان دروستکردووە و دەزانین چی بە دڵ و دەروونیدا دێت.. ئێمە لە شادەمارەکەی دڵی لێی نزیکترین.

(١٧) کاتێک دوو فریشتە چاودێرەکەی ئادەمیزاد کە لەلای راست و چەپیەوە دانیشتوون، (هەموو گوفتارو کردارێکی تۆمار دەکەن بە دەزگای زۆر پێشکەوتوو).

(١٨) هەر قسەیەکی لە دەم دەرچێت خێرا چاودێرێکی ئامادە؛ تۆماری دەکات.

(١٩) ئەی ئینسان؛ تەنگانەی مردن و ئازارەکانی هات، هاوڕێ لەگەڵ راستییەکاندا، ئەوسا پێت دەوترێت: ئا ئەوە ئەو بەسەرهات و رووداوەیە کە خۆتت لێ لادەداو پەنات لێ دەگرت.

(٢٠) لەوەودوا فوو دەکرێت بە صوردا، ئیتر ئەوە رۆژی پێشهاتنی هەڕەشەو ئاگادار کردنەوەکانە.

(٢١) رۆژی قیامەت دێت و هەموو کەسێک دوو کەسی لەگەڵدایە، یەکێکیان دەیگەیەنێت و ئەوی تریشیان شایەتە بەسەریەوە.

(٢٢) بە یەکەیەکەی بێباوەڕان دەوترێت: سوێند بەخوا بەڕاستی تۆ لەم بەسەرهاتانە نائاگابوویت و گوێی خۆتت لێ خەواندبوو، ئێستا ئێمە پەردەمان لەسەر چاوەکانت لاداوەو هەموو شتێک وەکو خۆی دەبینیت و ئەمڕۆ چاوەکانت تیژە...

(٢٣) فریشتەی هاوەڵ و چاودێری روو بە پەروەردگار دەڵێت: هەرچی کاروکردەوەی ئەم ئادەمییە هەیە هەمووی ئەوەتە لای من و یاداشت و تۆمارم کردووە.

(٢٤) (دوای لێپرسینەوە، خوا فەرمان دەدات بە دوو فریشتەکە) هەرچی کافرو بێباوەڕێکی سەرکەش و بوغزن هەیە فڕێی بدەنە ناو ئاگری دۆزەخەوە...

(٢٥) ئەوەی کە هەمیشە بەتوندی قەدەغەی هەموو خێرو چاکەیەکی دەکرد، مافی خەڵکی پێشێل دەکرد، خۆی بە گومان بوو، خەڵکیشی دەخستە گومانەوە...

(٢٦) ئەوە بوو کە هاوەڵ و شەریکی بۆ خوا بڕوا دەزانی.. کەواتە ئێوە هەردووکتان ئەو ئادەمییە فڕێ بدەنە ناو سزای سەختەوە.

(٢٧) هاوەڵە شەیتانەکەشی پاکانە دەکات و دەڵێت: پەروەردگارا، خۆ من لە خشتەم نەبردووە، من سەرکەشم نەکردووە، خۆی تاوانبارە، بەڵام خۆی لە نێو گومڕایی و سەرلێشێواویەکی دووردا نقووم بوو بوو.

(٢٨) (جا ئەوکاتەی شەیتان و ئادەمیزادلای خوادا دەبێتە کێشەیان، خوا بێ دەنگیان دەکات) دەفەرموێت: شەڕە دەمێ لە لای مندا مەکەن، بەڕاستی من پێشتر هەڕەشەی هاتنی ئەم رۆژەم خستبووە بەرچاوتان و، پێم راگەیاندبوون.

(٢٩) ئیتر قسەو بڕیاری من ناگۆڕێت و هەڵناوەشێتەوە.. من هیچ کات ستەمکاریش نیم لە بەندەکانم.

(٣٠) رۆژێک دێت بە دۆزەخ دەڵێین: ئایا پڕ بوویت؟ ئەویش لە وەڵامدا دەڵێت: ئایا کەسی تر ماوە خەڵکی زیاتر نیە؟!

(٣١) لەولایشەوە بەهەشت نزیک خراوەتەوە لە خواناس و پارێزکارو باوەڕداران، بێ ئەوەی دوور بێت لێیان، دەوترێت ...

(٣٢) ئەمە ئەو بەڵێنە بوو پێتان درابوو، بۆ هەموو ئەو کەسانەی کە زۆر تەوبەکارو خۆپارێزن لە گوناهو نافەرمانی خوا.

(٣٣) هەر کەس لەخوای میهرەبان بترسێت ولە پەنهاندا خۆی لە گوناه بپارێزێت و بەدڵێکی بەئاگا و تەوبەکارەوە بۆ بارەگای خوا بگەڕێتەوە....(جا بەو بەختەوەرانە دەوترێت):

(٣٤) بفەرموون بچنە ناو بەهەشتەوە لەگەڵ ئاشتی و ئارامی وهێمنیدا، ئا ئەوە ئیتر رۆژی نەمریی و نەبڕاوەیە.

(٣٥) هەرچیش داوای دەکەن و حەزی لێ دەکەن بۆیان ئامادەیە تیایدا، زۆر لەوەش زیاترمان لایە .

وَكَمْ أَهْلَكْنَا قَبْلَهُم مِّن قَرْنٍ هُمْ أَشَدُّ مِنْهُم بَطْشًا فَنَقَّبُوا فِي الْبِلَادِ هَلْ مِن مَّحِيصٍ ﴿٣٦﴾ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَذِكْرَىٰ لِمَن كَانَ لَهُ قَلْبٌ أَوْ أَلْقَى السَّمْعَ وَهُوَ شَهِيدٌ ﴿٣٧﴾ وَلَقَدْ خَلَقْنَا السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَا فِي سِتَّةِ أَيَّامٍ وَمَا مَسَّنَا مِن لُّغُوبٍ ﴿٣٨﴾ فَاصْبِرْ عَلَىٰ مَا يَقُولُونَ وَسَبِّحْ بِحَمْدِ رَبِّكَ قَبْلَ طُلُوعِ الشَّمْسِ وَقَبْلَ الْغُرُوبِ ﴿٣٩﴾ وَمِنَ اللَّيْلِ فَسَبِّحْهُ وَأَدْبَارَ السُّجُودِ ﴿٤٠﴾ وَاسْتَمِعْ يَوْمَ يُنَادِ الْمُنَادِ مِن مَّكَانٍ قَرِيبٍ ﴿٤١﴾ يَوْمَ يَسْمَعُونَ الصَّيْحَةَ بِالْحَقِّ ذَٰلِكَ يَوْمُ الْخُرُوجِ ﴿٤٢﴾ إِنَّا نَحْنُ نُحْيِي وَنُمِيتُ وَإِلَيْنَا الْمَصِيرُ ﴿٤٣﴾ يَوْمَ تَشَقَّقُ الْأَرْضُ عَنْهُمْ سِرَاعًا ذَٰلِكَ حَشْرٌ عَلَيْنَا يَسِيرٌ ﴿٤٤﴾ نَّحْنُ أَعْلَمُ بِمَا يَقُولُونَ وَمَا أَنتَ عَلَيْهِم بِجَبَّارٍ فَذَكِّرْ بِالْقُرْآنِ مَن يَخَافُ وَعِيدِ ﴿٤٥﴾

سُورَةُ الذَّارِيَاتِ

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

وَالذَّارِيَاتِ ذَرْوًا ﴿١﴾ فَالْحَامِلَاتِ وِقْرًا ﴿٢﴾ فَالْجَارِيَاتِ يُسْرًا ﴿٣﴾ فَالْمُقَسِّمَاتِ أَمْرًا ﴿٤﴾ إِنَّمَا تُوعَدُونَ لَصَادِقٌ ﴿٥﴾ وَإِنَّ الدِّينَ لَوَاقِعٌ ﴿٦﴾

(٣٦) خۆ ئێمە چەندەها هۆزو نەتەوەی پێش ئەوانمان لەناو بردووە، کە ئەوان لەمان بە دەسەلاتترو بەتواناتر بوون.. خۆ ئەوان بە شارەکان و شوێنەوارەکاندا گەڕاون و تێپەڕ بوون، ئایا هیچ دەربازبوونێک لە سزاکانیان بەدی کرد؟!

(٣٧) بەڕاستی ئا لەو بەسەرهاتانەدا یاداوەری هەیە بۆ کەسێک دڵێکی زیندووی هەبێت، یاخود گوێ بۆ قورئان رادێرێت، لەکاتێکدا ئامادەبێت بۆ فەرمانبەرداری وکردنی هەموو کارێکی دروست.

(٣٨) بەڕاستی ئێمە ئاسمانەکان و زەوی و هەرچی لە نێوانیاندا هەیە بە شەش رۆژ دروستمان کردوون، هیچ ماندویەتیەکیش روی تێ نەکردین.

(٣٩) جا تۆ ئەی پێغەمبەر ﷺ دان بەخۆتا بگرە لە بەرامبەر ئەو هەموو ناحەقی و نادروستیانەوە کە دەیڵێن و دێتە رێت، (بۆ بەرگەگرتنی ئەو گیروگرفتانەی کە بۆت پێش دەهێنن)، پێش خۆر هەڵاتن و پێش ئاوابوونی تەسبیحات و سوپاس و ستایشی پەروەردگارت بکە...

(٤٠) لە شەوگاریشدا تەسبیحات و ستایشی خوا بکە، هەروەها لە دوای نوێژەکانیش.

(٤١) گوێش بەچاکی رابگرە!! رۆژێک دێت بانگ وێژێک بانگ دەکات لە شوێنێکی نزیکەوە...

(٤٢) ئەو رۆژە دەنگێکی زۆر بەرز و سامناک بەراستیی دەبیستن، دیارە کە ئەوە رۆژی هاتنە دەرەوەیە لە توێی خاکدا.

(٤٣) بەڕاستی هەر ئێمە ژیان دەبەخشین و دەشیان مرێنین، گەڕانەوەش هەر بۆ لای ئێمەیە.

(٤٤) رۆژێک دێت زەوی لە ئاستی ئەوان شەق دەبات و خەڵکی لە گۆڕەکانیان بەگورجی دێنە دەرەوە.. ئا ئەوە کۆ کردنەوەیەکە لای ئێمە کارێکی زۆر ئاسانە (بۆ لێپرسینەوە).

(٤٥) ئەی محمد ﷺ ئێمە چاک ئاگادارین بەوەی کە دەیڵێن و چۆن دژایەتی ئەم راستیە دەکەن!.. خۆ تۆ زۆردارنیت بەسەریانەوە تا بەزۆر باوەڕیان بەسەردا بسەپێنیت .. کەواتە تۆ تەنها ئەوەت لەسەرە کە بە قورئان یادەوەریی ئەو کەسانە بکەیت کە لە هەڕەشەکانی ئێمە دەترسن.

## سوورەتی (الذاریـات)

بەناوی خوای بەخشندە و میهرەبان

(١) سوێند بەو رەشەبا و ئەو بایەی کە هەورو هەڵمی ئاو هەڵدەگرێت و پەخشی دەکاتەوە، یان تەپ و تۆز بەرز دەکاتەوە (کە رۆڵی هەیە لە باران بارینداا).

(٢) ئینجا بە هەڵگرانی باری قورس و گران (لە هەڵمی ئاو).

(٣) هەروەها بەو هەورانە کە بەئاسانی بەئاسماندا لە شوێنێکەوە دەگوێزرێنەوە بۆ شوێنێکی تر، یاخود سوێند بەو کەشتیانەی بەئاسانی بەسەر ئاودا دێن و دەچن.

(٤) ئینجا سوێند بەو فریشتانەی کە کاروبار دابەش دەکەن.

(٥) بەڕاستی ئەو بەڵێنانەی پێتان دراوە راستەو هەر دێتە دی.

(٦) بێگومان رۆژی لێ پرسینەوەش هەر دێت و بەڕێوەیە.

وَٱلسَّمَآءِ ذَاتِ ٱلْحُبُكِ ﴿٧﴾ إِنَّكُمْ لَفِى قَوْلٍ مُّخْتَلِفٍ ﴿٨﴾ يُؤْفَكُ عَنْهُ مَنْ أُفِكَ ﴿٩﴾ قُتِلَ ٱلْخَرَّٰصُونَ ﴿١٠﴾ ٱلَّذِينَ هُمْ فِى غَمْرَةٍ سَاهُونَ ﴿١١﴾ يَسْـَٔلُونَ أَيَّانَ يَوْمُ ٱلدِّينِ ﴿١٢﴾ يَوْمَ هُمْ عَلَى ٱلنَّارِ يُفْتَنُونَ ﴿١٣﴾ ذُوقُوا۟ فِتْنَتَكُمْ هَٰذَا ٱلَّذِى كُنتُم بِهِۦ تَسْتَعْجِلُونَ ﴿١٤﴾ إِنَّ ٱلْمُتَّقِينَ فِى جَنَّٰتٍ وَعُيُونٍ ﴿١٥﴾ ءَاخِذِينَ مَآ ءَاتَىٰهُمْ رَبُّهُمْ ۚ إِنَّهُمْ كَانُوا۟ قَبْلَ ذَٰلِكَ مُحْسِنِينَ ﴿١٦﴾ كَانُوا۟ قَلِيلًا مِّنَ ٱلَّيْلِ مَا يَهْجَعُونَ ﴿١٧﴾ وَبِٱلْأَسْحَارِ هُمْ يَسْتَغْفِرُونَ ﴿١٨﴾ وَفِىٓ أَمْوَٰلِهِمْ حَقٌّ لِّلسَّآئِلِ وَٱلْمَحْرُومِ ﴿١٩﴾ وَفِى ٱلْأَرْضِ ءَايَٰتٌ لِّلْمُوقِنِينَ ﴿٢٠﴾ وَفِىٓ أَنفُسِكُمْ ۚ أَفَلَا تُبْصِرُونَ ﴿٢١﴾ وَفِى ٱلسَّمَآءِ رِزْقُكُمْ وَمَا تُوعَدُونَ ﴿٢٢﴾ فَوَرَبِّ ٱلسَّمَآءِ وَٱلْأَرْضِ إِنَّهُۥ لَحَقٌّ مِّثْلَ مَآ أَنَّكُمْ تَنطِقُونَ ﴿٢٣﴾ هَلْ أَتَىٰكَ حَدِيثُ ضَيْفِ إِبْرَٰهِيمَ ٱلْمُكْرَمِينَ ﴿٢٤﴾ إِذْ دَخَلُوا۟ عَلَيْهِ فَقَالُوا۟ سَلَٰمًا ۖ قَالَ سَلَٰمٌ قَوْمٌ مُّنكَرُونَ ﴿٢٥﴾ فَرَاغَ إِلَىٰٓ أَهْلِهِۦ فَجَآءَ بِعِجْلٍ سَمِينٍ ﴿٢٦﴾ فَقَرَّبَهُۥٓ إِلَيْهِمْ قَالَ أَلَا تَأْكُلُونَ ﴿٢٧﴾ فَأَوْجَسَ مِنْهُمْ خِيفَةً ۖ قَالُوا۟ لَا تَخَفْ ۖ وَبَشَّرُوهُ بِغُلَٰمٍ عَلِيمٍ ﴿٢٨﴾ فَأَقْبَلَتِ ٱمْرَأَتُهُۥ فِى صَرَّةٍ فَصَكَّتْ وَجْهَهَا وَقَالَتْ عَجُوزٌ عَقِيمٌ ﴿٢٩﴾ قَالُوا۟ كَذَٰلِكِ قَالَ رَبُّكِ ۖ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلْحَكِيمُ ٱلْعَلِيمُ ﴿٣٠﴾

(٧) سوێند بە ئاسمانی خاوەن ڕێگەو ڕێک و پێک و ڕازاوە.
(٨) بێگومان ئەی خوانەناسان ئێوە لەگوفتارێکی بێ سەروبنداندن کە دوورە لە ڕاستی و حەقیقەتەوە.
(٩) ئەو کەسەی لە زانستی خوادا لادراوە بە هۆی تاوانیەوە لە باوەڕ هێنان لادەدرێت.
(١٠) دەکۆ بەکوشتچن درۆزن و بوختانچیەکان...
(١١) ئەوانەی کە لە گومڕای و تاریکیدا ڕۆچوون و پێوەی سەرگەرمن.
(١٢) بەگاڵتە و تەڵفیسیەوە دەڵێن یان دەپرسن: ڕۆژی قیامەت کەی پێش دێت؟!
(١٣) ئەو ڕۆژە کەبەرپا دەبێت بەئاگر دەبرژێنرێن...
(١٤) پێیان دەوترێت: بچێژن ئەو بەڵایەی کە بەسەر خۆتان هێنا، ئەمە ئەو سزاو ئازارەیە کە بەگاڵتەوە پەلەتان لە پێشهاتنی دەکرد.
(١٥) بەڕاستی پارێزکارانیش لە باخەکان و کانیاوەکانی بەهەشتدا ژیانی خۆش دەبەنە سەر.
(١٦) ئەو شتانەی کە پەروەردگار بۆی ئامادەکردون پێیان دەبەخشێت، ئەوانیش بەخۆشی و شادیەوە وەریدەگرن، بەڕاستی ئەوانە پێشتر لە دنیاداچاکەکارو چاکەخواز بوون....
(١٧) لە شەوگاردا زۆر کەم دەخەوتن و رادەکشان (چونکە سەرگەرمی شەو نوێژ و دەور کردنەوەی قورئان و یادی خوا بوون)...
(١٨) لە بەرەبەیانەکانیشدا داوای لێخۆشبوونیان لە پەروەردگاریان دەکرد (تا لێیان ببورێت)..
(١٩) لە ماڵ و سامانیشیاندا بەشی هەژارو نەدارانیان تەرخان کردبوو.
(٢٠) بێگومان لەسەر گۆی زەویدا بەڵگە و نیشانەی زۆر هەیە (لەسەر دەسەڵات و زانیاری‌خوا) بۆ کەسانێک کە بە شوێن دڵنیاییدا دەگەڕێن.
(٢١) هەروەها لە خودی خۆشتاندا (لە هەموو خانەیەکی لەشدا، لە هەموو ئەندامێکداو، لە هەموو کۆئەندامێکدا، لە ڕۆح ونەفس وعەقڵدا..هتد بەڵگەی بێ‌سنوور هەیە لەسەر زانایی و بەتوانایی و جوانکاری زاتی بەدیهێنەر) ئایا ئەوە بۆ بینایتان ناخەنە کار.
(٢٢) سەرچاوەی رزق و ڕۆزیتان لە ئاسمانەوەیە (لە خوا داوابکەن) هەروەها ئەوانەش کە بەڵێنتان پێدراوە.
(٢٣) سوێند بە پەروەردگاری ئاسمان و زەوی، ئەو بەڵێنانە حەقیقەت و ڕاستەقینەیە، هەروەک چۆن ئێوە قسەی ڕاست و دروست دەکەن.
(٢٤) ئەی پێغەمبەرﷺ ئایا هەواڵی میوانە بەڕێزەکانی ئیبراهیمت پێنەگەیشتووە؟.
(٢٥) کاتێک چوون بۆ سەردانی و وتیان: سڵاو، ئەویش وتی، سڵاو لە ئێوەش بێت، هەرچەندە ناتانناسم.
(٢٦) ئەوسا ئیتر خۆی دزیەوە چوو بەهاوکاری خێزانی گوێرەکەیەکی قەڵەوی(سەری بری و سووریانکردەوە و) هێنای.
(٢٧) بردی ولێی نزیک کردنەوە، فەرمووی لێکردن کە بینی ناخۆن، وتی: ئەوە نافەرموون، ئەوە ناخۆن؟!
(٢٨) ئیبراهیم ترسێکی لێنیشت (چونکە وای زانی شتێکیان لەژێر سەردایە) بۆیە خێرا وتیان: مەترسە ئێمە فریشتەین، مژدەشیان پێدا کە خوا بەم نزیکانە منداڵێکی زانایان پێدەبەخشێت.
(٢٩) خێزانەکەی قریوەیەکی کرد و دەنگی لێ بەرز بۆوە و دەستی بەئاستەم دا بەڕوومەتی خۆیدا (وەکو داب و نەریتی ئافرەتان لەکاتی سەرسامیدا) وتی: پیرەژنێکی نەزۆک، چۆن منداڵی دەبێت؟!
(٣٠) فریشتەکان وتیان: ئەوە فەرمانی پەروەردگارتە و ئەو زاتێکی دانا و زانایە.



۞ قَالَ فَمَا خَطْبُكُمْ أَيُّهَا الْمُرْسَلُونَ ﴿٣١﴾ قَالُوا إِنَّا أُرْسِلْنَا إِلَىٰ قَوْمٍ مُجْرِمِينَ ﴿٣٢﴾ لِنُرْسِلَ عَلَيْهِمْ حِجَارَةً مِنْ طِينٍ ﴿٣٣﴾ مُسَوَّمَةً عِنْدَ رَبِّكَ لِلْمُسْرِفِينَ ﴿٣٤﴾ فَأَخْرَجْنَا مَنْ كَانَ فِيهَا مِنَ الْمُؤْمِنِينَ ﴿٣٥﴾ فَمَا وَجَدْنَا فِيهَا غَيْرَ بَيْتٍ مِنَ الْمُسْلِمِينَ ﴿٣٦﴾ وَتَرَكْنَا فِيهَا آيَةً لِلَّذِينَ يَخَافُونَ الْعَذَابَ الْأَلِيمَ ﴿٣٧﴾ وَفِي مُوسَىٰ إِذْ أَرْسَلْنَاهُ إِلَىٰ فِرْعَوْنَ بِسُلْطَانٍ مُبِينٍ ﴿٣٨﴾ فَتَوَلَّىٰ بِرُكْنِهِ وَقَالَ سَاحِرٌ أَوْ مَجْنُونٌ ﴿٣٩﴾ فَأَخَذْنَاهُ وَجُنُودَهُ فَنَبَذْنَاهُمْ فِي الْيَمِّ وَهُوَ مُلِيمٌ ﴿٤٠﴾ وَفِي عَادٍ إِذْ أَرْسَلْنَا عَلَيْهِمُ الرِّيحَ الْعَقِيمَ ﴿٤١﴾ مَا تَذَرُ مِنْ شَيْءٍ أَتَتْ عَلَيْهِ إِلَّا جَعَلَتْهُ كَالرَّمِيمِ ﴿٤٢﴾ وَفِي ثَمُودَ إِذْ قِيلَ لَهُمْ تَمَتَّعُوا حَتَّىٰ حِينٍ ﴿٤٣﴾ فَعَتَوْا عَنْ أَمْرِ رَبِّهِمْ فَأَخَذَتْهُمُ الصَّاعِقَةُ وَهُمْ يَنْظُرُونَ ﴿٤٤﴾ فَمَا اسْتَطَاعُوا مِنْ قِيَامٍ وَمَا كَانُوا مُنْتَصِرِينَ ﴿٤٥﴾ وَقَوْمَ نُوحٍ مِنْ قَبْلُ إِنَّهُمْ كَانُوا قَوْمًا فَاسِقِينَ ﴿٤٦﴾ وَالسَّمَاءَ بَنَيْنَاهَا بِأَيْدٍ وَإِنَّا لَمُوسِعُونَ ﴿٤٧﴾ وَالْأَرْضَ فَرَشْنَاهَا فَنِعْمَ الْمَاهِدُونَ ﴿٤٨﴾ وَمِنْ كُلِّ شَيْءٍ خَلَقْنَا زَوْجَيْنِ لَعَلَّكُمْ تَذَكَّرُونَ ﴿٤٩﴾ فَفِرُّوا إِلَى اللَّهِ إِنِّي لَكُمْ مِنْهُ نَذِيرٌ مُبِينٌ ﴿٥٠﴾ وَلَا تَجْعَلُوا مَعَ اللَّهِ إِلَٰهًا آخَرَ إِنِّي لَكُمْ مِنْهُ نَذِيرٌ مُبِينٌ ﴿٥١﴾

(٣١) ئینجا ئیبراهیم لێی پرسین: باشە بێجگە لەو مژدەیە چ کارێکی گرنگتان بەدەستەوەیە؟!

(٣٢) فریشتەکان وتیان: بەڕاستی ئێمە ڕەوانە کراوین بۆ گەلێکی تاوانبار و تاوانکار.

(٣٣) بۆ ئەوەی بەرد بارانیان بکەین بە بەردێک کە لە قوڕ دروست کراوە.

(٣٤) هەموو ئەو بەردانە نیشانەدارن لەلایەن پەروەردگارتەوە بۆ ناپوخت و لە سنوور دەرچووەکان.

(٣٥) جا هەرچی لەو ناوچەیەدا بوو لە ئیمانداران دەرمانکردن و ڕزگارمان کردن...

(٣٦) لەماڵە موسڵمانێکیش زیاترمان بەدی نەکرد.

(٣٧) (پاشان ئەو شوێنەمان بە شێوەیەک کاول کرد)، کردمانە پەند و بەڵگە بۆ هەموو ئەو کەسانەی لە سزای بە ئێشی ئێمە دەترسن..

(٣٨) لە بەسەرهاتی موسایشدا پەند و ئامۆژگاری هەیە کەناردمان بۆ لای فیرعەون بە موعجیزەیەکی ئاشکراو ڕوونەوە.

(٣٩) ئەویش پشتی هەڵکرد بەهۆی سەربازو دارو دەستەکەیەوەو وتی: (ئەم فرستادەیە) جادووگەرە، یان شێتە!!

(٤٠) جا ئێمەش خۆی و سەربازەکانیمان گرفتار کرد و پێچامانەوە و فڕێمان دانە دەریاوە، لەکاتێکدا ئەو لۆمەکراوە.

(٤١) هەروەها لە بەسەرهاتی عادیشدا پەند و ئامۆژگاری هەیە، کاتێک لە سەرەنجامی سەرکەشیان بایەکی بێخێرمان هەڵکردە سەریان.

(٤٢) ئەو بایە بەسەر هەر شوێنێک و هەر شتێک و هەر کەسێکدا بڕۆیشتایە وازی لێ نەدەهێنا هەتا بێکەڵکی دەکرد و وەک شتێکی فڕێ دراوی لێ دەکرد.

(٤٣) هەروەها لە بەسەرهاتی ثەمودیشدا پەند و ئامۆژگاری هەیە، کاتێک پێیان وترا: تا ماوەیەک ڕابوێرن!!

(٤٤) ئەوانیش لە فەرمانی پەروەردگاریان یاخی بوون، کتوپڕ بروسکەیەک پێچانیەوە وبەچاوی ئەبڵەقەوە دەیانڕوانی.

(٤٥) ئیتر نەیانتوانی هەڵسنەوە و سەرکەوتووش نەبوون.

(٤٦) پێشتریش هۆزی نوح بەڕاستی هەر تاوانبارو خوانەناس ولارو وێربوون (ئەوانیشمان بەزریانەکە لەناوبرد).

(٤٧) ئێمە ئاسمانمان بەدەستی قودرەتی خۆمان دروست کرد، بەردەوامیش گەورەی دەکەین و فراوانی دەکەین.
(ئەمە ئاماژەیە بۆ ڕاستیەکی زانستی کە زاناکانی گەردوونناسی دەیسەلمێنن).

(٤٨) زەویشمان ڕاخستووە (ژیانمان لەسەری ئاسان کردووە) بەڕاستی خوا زاتێکی کارساز و کاربەجێیە.

(٤٩) لەهەموو شتێک ئێمە جووتمان دروست کردووە (لەجیهانی ئادەمیزاد و گیاندار و ڕووەک و بێگیاندا، لە هەموو شتێکی ماددی و مەعنەویدا) بۆ ئەوەی بیربکەنەوە و یاداوەری وەربگرن.

(٥٠) بە پەلەو گورج وگۆڵ بن بۆ بەدەست هێنانی ڕەزامەندی خوا، بۆ هەرچی پەروەردگار پێی خۆشە، دڵنیاش بن کەمن (واتە پێغەمبەر ﷺ) لەلایەن خواوە ترسێنەرێکی ئاشکرام ئەگەر یاخی و سەرکەش بن....

(٥١) هیچ مەکەن بەهاوەڵ و هاوتای خوا، چونکە من بەڕاستی نێردراوێکی ترسێنەری ئاشکرام بۆتان لەلایەن خواوە.

كَذَٰلِكَ مَآ أَتَى ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِهِم مِّن رَّسُولٍ إِلَّا قَالُواْ سَاحِرٌ أَوۡ مَجۡنُونٌ ﴿٥٢﴾ أَتَوَاصَوۡاْ بِهِۦۚ بَلۡ هُمۡ قَوۡمٞ طَاغُونَ ﴿٥٣﴾ فَتَوَلَّ عَنۡهُمۡ فَمَآ أَنتَ بِمَلُومٖ ﴿٥٤﴾ وَذَكِّرۡ فَإِنَّ ٱلذِّكۡرَىٰ تَنفَعُ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ ﴿٥٥﴾ وَمَا خَلَقۡتُ ٱلۡجِنَّ وَٱلۡإِنسَ إِلَّا لِيَعۡبُدُونِ ﴿٥٦﴾ مَآ أُرِيدُ مِنۡهُم مِّن رِّزۡقٖ وَمَآ أُرِيدُ أَن يُطۡعِمُونِ ﴿٥٧﴾ إِنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلرَّزَّاقُ ذُو ٱلۡقُوَّةِ ٱلۡمَتِينُ ﴿٥٨﴾ فَإِنَّ لِلَّذِينَ ظَلَمُواْ ذَنُوبٗا مِّثۡلَ ذَنُوبِ أَصۡحَٰبِهِمۡ فَلَا يَسۡتَعۡجِلُونِ ﴿٥٩﴾ فَوَيۡلٞ لِّلَّذِينَ كَفَرُواْ مِن يَوۡمِهِمُ ٱلَّذِي يُوعَدُونَ ﴿٦٠﴾

## سُورَةُ الطُّورِ

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

وَٱلطُّورِ ﴿١﴾ وَكِتَٰبٖ مَّسۡطُورٖ ﴿٢﴾ فِي رَقّٖ مَّنشُورٖ ﴿٣﴾ وَٱلۡبَيۡتِ ٱلۡمَعۡمُورِ ﴿٤﴾ وَٱلسَّقۡفِ ٱلۡمَرۡفُوعِ ﴿٥﴾ وَٱلۡبَحۡرِ ٱلۡمَسۡجُورِ ﴿٦﴾ إِنَّ عَذَابَ رَبِّكَ لَوَٰقِعٞ ﴿٧﴾ مَّا لَهُۥ مِن دَافِعٖ ﴿٨﴾ يَوۡمَ تَمُورُ ٱلسَّمَآءُ مَوۡرٗا ﴿٩﴾ وَتَسِيرُ ٱلۡجِبَالُ سَيۡرٗا ﴿١٠﴾ فَوَيۡلٞ يَوۡمَئِذٖ لِّلۡمُكَذِّبِينَ ﴿١١﴾ ٱلَّذِينَ هُمۡ فِي خَوۡضٖ يَلۡعَبُونَ ﴿١٢﴾ يَوۡمَ يُدَعُّونَ إِلَىٰ نَارِ جَهَنَّمَ دَعًّا ﴿١٣﴾ هَٰذِهِ ٱلنَّارُ ٱلَّتِي كُنتُم بِهَا تُكَذِّبُونَ ﴿١٤﴾

هەر ئا بەو شێوەیە هیچ پێغەمبەرێک لە پێش ئەماندا نەهاتووە، خوانەناسان نەیانوتبێت جادووگەرە، یان شێتە.

سەیرە! ئایا دەڵێی بەگوێی یەکدا خوێندویانە و یەکتریان راسپاردووە، نەخێر، بەڵکو ئەوانە هەر قەومێکی ستەمکارو سەرکەشن.

تۆ ئەی محمد ﷺ گوێیان مەدەرێ چونکە تۆ لۆمەکراو نابیت (لەسەر باوەڕ نەهێنانیان).

بەڵکو تۆ هەمیشە ئامۆژگاریان بکە، چونکە بەراستی ئامۆژگاری سوود بەئیمانداران دەگەیەنێت.

بێگومان من پەری و ئادەمیزادم دروست نەکردووە تەنها بۆ ئەوە نەبێت کە من بپەرستن و فەرمانبەردارم بن.

نەڕۆزیم لێیان دەوێت نەخواردن وخواردنەوە.

چونکە بەڕاستی هەر خوا خۆی رۆزی بەخشە و خاوەنی هێزو دەسەڵاتی پتەوە.

بێگومان بۆ ئەوانەی ستەمیان کردووە تۆڵەو سزای زۆرمان بۆ ئامادەکردوون، هەروەک چۆن بۆ هاوەڵ وهاوبیرەکانیان ئامادەمانکردووە، دەبا ئیتر پەلەم لێنەکەن (چونکە بەم زوانە یەخەیان دەگرێت)

ئینجا وەیل و ئاهو ناڵە بۆ ئەوانەی کە رێبازی کوفرو خوانەناسیان گرتۆتەبەر لەو رۆژەی کە هەڕەشەیان لیکراوە و بەم زووانە پێش دێت.

سوورەتی (الطـــور)

بەناوی خوای بەخشندە و میهرەبان

سوێند بەکێوی ـ طور ـ (کە خوای گەورە گفتوگۆی لەگەڵ موسادا لە نزیکی ئەنجامدا)

سوێند بەکتێبی نوسراو کە (لوح المحفوظة).

کەلە لاپەڕەی تەنکی گرنگدایە.

سوێند ـ بە کەعبە ـ کە هەمیشە ئاوەدانە بە نوێژگەران، وە (ئەوانەی بۆ حەج و عەمرە دەچن) هەروەها (بیت المعمور) شوێنێکە لە ئاسمانی حەوتەم کە دیاریکراوە بۆ خواپەرستی فریشتەکان هەروەک چۆن کەعبە پیرۆزە لای ئیمانداران، (لە فەرمودەیەکی راست و دروستدا ئاماژەی بۆ کراوە).

هەروەها سوێند بە سەقفی بەرزو بڵند (کە ئاسمان دەگرێتەوە، خوای گەورە دەیەوێت سەرنجمان راکێشێت بۆ لای).

سوێند بە دەریای پڕ لە ئاو یان دەریای داگیرساو (کە رۆژی قیامەت دادەگیرسێت و دەتەقێتەوە).

(پەروەردگاری مەزن سوێند بەو هەموو شتانە دەخوات، ئینجا دەفەرموێت): بەڕاستی سزاو ئازاری پەروەردگاری تۆ ئەی محمد ﷺ هەر پێش دێت.

کەسیش ناتوانێت بەری بگرێت و دەستی پێوە بنێت و نەهێڵێت.

ئەو رۆژە ئەستێرە وهەسارەکانی ئاسمان هەموو بەیەکدا دەدەن، (خوای گەورە تێکیان دەدات وهەڵیان دەوەشێنێت)

کێوەکانیش لە جێی خۆیان دەجولێن و دەڕۆن، (وەک خوری، وەک هەور، ، زەویان پێ تەخت دەکرێت).

کەواتە واوەیلا و هاوار بۆ ئەوانەی کە باوەڕیان بە حەق و راستی نەکرد و بەدرۆیان دەزانی لەو رۆژەدا.

ئەوانەی کە رۆچوون و گاڵتە دەکەن بە ئیسلام و پێغەمبەر و قورئان.

رۆژێک دێت بەتوندی پاڵیان پێوە دەنرێت بۆ ناو دۆزەخ (دەنگ لە سینەیانەوە دێت ئەوەندە پاڵەکە توندە).

پێیان دەوترێت: ئەمە ئەو ئاگرو دۆزەخەیە کە کاتی خۆی بڕواتان پێی نەبوو بە گاڵتەتان گرتبوو.

أَفَسِحْرٌ هَٰذَآ أَمْ أَنتُمْ لَا تُبْصِرُونَ ﴿١٥﴾ ٱصْلَوْهَا فَٱصْبِرُوٓا۟ أَوْ لَا تَصْبِرُوا۟ سَوَآءٌ عَلَيْكُمْ ۖ إِنَّمَا تُجْزَوْنَ مَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴿١٦﴾ إِنَّ ٱلْمُتَّقِينَ فِى جَنَّٰتٍ وَنَعِيمٍ ﴿١٧﴾ فَٰكِهِينَ بِمَآ ءَاتَىٰهُمْ رَبُّهُمْ وَوَقَىٰهُمْ رَبُّهُمْ عَذَابَ ٱلْجَحِيمِ ﴿١٨﴾ كُلُوا۟ وَٱشْرَبُوا۟ هَنِيٓـًٔۢا بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴿١٩﴾ مُتَّكِـِٔينَ عَلَىٰ سُرُرٍ مَّصْفُوفَةٍ ۖ وَزَوَّجْنَٰهُم بِحُورٍ عِينٍ ﴿٢٠﴾ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَٱتَّبَعَتْهُمْ ذُرِّيَّتُهُم بِإِيمَٰنٍ أَلْحَقْنَا بِهِمْ ذُرِّيَّتَهُمْ وَمَآ أَلَتْنَٰهُم مِّنْ عَمَلِهِم مِّن شَىْءٍ ۚ كُلُّ ٱمْرِئٍۭ بِمَا كَسَبَ رَهِينٌ ﴿٢١﴾ وَأَمْدَدْنَٰهُم بِفَٰكِهَةٍ وَلَحْمٍ مِّمَّا يَشْتَهُونَ ﴿٢٢﴾ يَتَنَٰزَعُونَ فِيهَا كَأْسًا لَّا لَغْوٌ فِيهَا وَلَا تَأْثِيمٌ ﴿٢٣﴾ ۞ وَيَطُوفُ عَلَيْهِمْ غِلْمَانٌ لَّهُمْ كَأَنَّهُمْ لُؤْلُؤٌ مَّكْنُونٌ ﴿٢٤﴾ وَأَقْبَلَ بَعْضُهُمْ عَلَىٰ بَعْضٍ يَتَسَآءَلُونَ ﴿٢٥﴾ قَالُوٓا۟ إِنَّا كُنَّا قَبْلُ فِىٓ أَهْلِنَا مُشْفِقِينَ ﴿٢٦﴾ فَمَنَّ ٱللَّهُ عَلَيْنَا وَوَقَىٰنَا عَذَابَ ٱلسَّمُومِ ﴿٢٧﴾ إِنَّا كُنَّا مِن قَبْلُ نَدْعُوهُ ۖ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلْبَرُّ ٱلرَّحِيمُ ﴿٢٨﴾ فَذَكِّرْ فَمَآ أَنتَ بِنِعْمَتِ رَبِّكَ بِكَاهِنٍ وَلَا مَجْنُونٍ ﴿٢٩﴾ أَمْ يَقُولُونَ شَاعِرٌ نَّتَرَبَّصُ بِهِۦ رَيْبَ ٱلْمَنُونِ ﴿٣٠﴾ قُلْ تَرَبَّصُوا۟ فَإِنِّى مَعَكُم مِّنَ ٱلْمُتَرَبِّصِينَ ﴿٣١﴾



(١٥) باشە، ئەمە جادووە نیشانتان دەدرێت یان ئێوە راستی نابینن؟!
(١٦) دەبێت بچنە ناوی و سزا بچێژن، جا ئیتر خۆرادەگرن یان خۆڕاناگرن وەک یەکە بۆتان، بێگومان تۆڵەی ئەو کاروکردەوانەتان هەر دەدرێتەوە کە دەتانکرد.
(١٧) لەولاشەوە بەڕاستی ئەوانەی کە لە دنیادا خواناس و دینداربوون، لە باخەکانی بەهەشت و ناز و نیعمەتدا، ژیانی پڕ لە بەختیاری و کامەرانی دەبەنەسەر.
(١٨) زۆر کەیف خۆش و دڵخۆش و رووخۆشن بەو بەخششانەی کە پەروەردگاریان پێی بەخشیون، هەر پەروەردگاریشیان لە سزاو تاڵاوی دۆزەخ پاراستونی.
(١٩) پێیان دەوترێت بخۆن وبخۆنەوە نۆشی گیانتان بێت لە پاداشتی کردەوەی چاک و رێک و پێکتاندا.
(٢٠) (ئەو بەختەوەرانە بە کەماڵی ئیسراحەت) پاڵیان داوەتەوە لەسەر کورسی و قەنەفە رازاوەکان، کە بە شێوەیەکی جوان و رێک ریز کراون، ئێمە هاوسەرانی حۆری چاوگەشمان لێ مارە کردوون.
(٢١) جا ئەوانەی باوەڕیان هێناوە و نەوەکانشیان بە ئیمان و باوەڕەوە شوێنیان کەوتوون، ئەوانە لە بەهەشتدا پێک شاد دەکەینەوە (تا کامەرانی و خۆشییان زیاتر بێت)، وەنەبێت ئەوانەی کە پلەی بەرزیان دەستکەوتووە دایان بەزێنین بۆ پلەی نزمتر، چونکە ئێمە پاداشتی کردەوەی کەس کەم ناکەینەوە (ئەگەر زیادی نەکەین) لە هەمان کاتدا هەرکەسە بارمتەی کردەوەی خۆیەتی.
(٢٢) بەردەوام حەزیان لە هەر میوە وگۆشتێک بێت پێشکەشیان دەکەین.
(٢٣) بە دڵ خۆشیەوە لە کاسی تایبەتیدا شەراب دەنۆشن، جارجار بۆ خۆشی لە یەکتری دەسێنن، دوور لە رەفتاری ناشرین و گوناهو تاوانبارکردنی یەکتر.
(٢٤) هەروەها منداڵانی جوان و ئێسک سووک بە دەوریاندا دێن و خزمەتیان دەکەن دەڵێی مرواری پاک و بێگەردن.
(٢٥) (جا دوای ئەو عەیش و نۆش و کەیف و ئاهەنگە) رووەکەنە یەکترو دەستە دەستە لەیەک نزیک دەبنەوە، پرسیار لە لە رابوردوی یەکتر دەکەن (دیارە هەرکەسە لەو بەیەکگەیشتنانەدا بەشێک لە سەرگوزەشتەی خۆی نیشانی ئیمانداران هاوەڵ و میوانی دەدات، لەگەڵ روونکردنەوەی پێویستدا، کە بە دەزگای زۆر پێشکەوتوو تۆمارکراوە).
(٢٦) سەرئەنجام هەموو بەیەک دەنگ دەڵێن: بەڕاستی (کارێکی چاکمان دەکرد سوپاس بۆ خوا) چونکە کاتی خۆی کە لەناو ماڵ و خێزانماندا بووین، ترسی لێپرسینەوەی رۆژی قیامەتمان هەبوو، هەروەها بەبەزەییش بووین لەناویاندا و مەبەستمان بوو ئەوانیش وەک ئێمە خواناس بن.
(٢٧) بەهۆی ئەوەوە خوای میهرەبانیش لای رەحمەتی لێ کردینەوە و منەتباری کردین و لە سزای دۆزەخی پڕئێش پاراستینی.
(٢٨) بەڕاستی ئێمە کاتی خۆی هاناو هاوارمان هەر بۆ ئەو دەبردو دەمانپەرست، چونکە بێگومان هەر ئەو زاتە خوایەکی چاکەخوازو میهرەبان و دلۆڤانە.
(٢٩) ئەی‌محمد ﷺ ئامۆژگاری ئەوخەڵکە بکە، چونکە تۆ بەهۆی نازو نیعمەتی پەروەردگارتەوە نە فاڵچیت، نەشێتی.
(٣٠) خوانەناس و دڵڕەقەکان دەڵێن: ئەمە شاعیرێکە و چاوەڕوانی مەرگی دەکەین!!
(٣١) پێیان بڵێ: چاوەڕێ بن منیش لەگەڵ ئێوەدا چاوەڕێم (بزانین سەرئەنجام کێ سەردەکەوێت، کێ سەرفرازە؟).

أَمْ تَأْمُرُهُمْ أَحْلَامُهُم بِهَٰذَا ۚ أَمْ هُمْ قَوْمٌ طَاغُونَ ﴿٣٢﴾ أَمْ يَقُولُونَ تَقَوَّلَهُ ۚ بَل لَّا يُؤْمِنُونَ ﴿٣٣﴾ فَلْيَأْتُوا بِحَدِيثٍ مِّثْلِهِ إِن كَانُوا صَادِقِينَ ﴿٣٤﴾ أَمْ خُلِقُوا مِنْ غَيْرِ شَيْءٍ أَمْ هُمُ الْخَالِقُونَ ﴿٣٥﴾ أَمْ خَلَقُوا السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ ۚ بَل لَّا يُوقِنُونَ ﴿٣٦﴾ أَمْ عِندَهُمْ خَزَائِنُ رَبِّكَ أَمْ هُمُ الْمُصَيْطِرُونَ ﴿٣٧﴾ أَمْ لَهُمْ سُلَّمٌ يَسْتَمِعُونَ فِيهِ ۖ فَلْيَأْتِ مُسْتَمِعُهُم بِسُلْطَانٍ مُّبِينٍ ﴿٣٨﴾ أَمْ لَهُ الْبَنَاتُ وَلَكُمُ الْبَنُونَ ﴿٣٩﴾ أَمْ تَسْأَلُهُمْ أَجْرًا فَهُم مِّن مَّغْرَمٍ مُّثْقَلُونَ ﴿٤٠﴾ أَمْ عِندَهُمُ الْغَيْبُ فَهُمْ يَكْتُبُونَ ﴿٤١﴾ أَمْ يُرِيدُونَ كَيْدًا ۖ فَالَّذِينَ كَفَرُوا هُمُ الْمَكِيدُونَ ﴿٤٢﴾ أَمْ لَهُمْ إِلَٰهٌ غَيْرُ اللَّهِ ۚ سُبْحَانَ اللَّهِ عَمَّا يُشْرِكُونَ ﴿٤٣﴾ وَإِن يَرَوْا كِسْفًا مِّنَ السَّمَاءِ سَاقِطًا يَقُولُوا سَحَابٌ مَّرْكُومٌ ﴿٤٤﴾ فَذَرْهُمْ حَتَّىٰ يُلَاقُوا يَوْمَهُمُ الَّذِي فِيهِ يُصْعَقُونَ ﴿٤٥﴾ يَوْمَ لَا يُغْنِي عَنْهُمْ كَيْدُهُمْ شَيْئًا وَلَا هُمْ يُنصَرُونَ ﴿٤٦﴾ وَإِنَّ لِلَّذِينَ ظَلَمُوا عَذَابًا دُونَ ذَٰلِكَ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَهُمْ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٤٧﴾ وَاصْبِرْ لِحُكْمِ رَبِّكَ فَإِنَّكَ بِأَعْيُنِنَا ۖ وَسَبِّحْ بِحَمْدِ رَبِّكَ حِينَ تَقُومُ ﴿٤٨﴾ وَمِنَ اللَّيْلِ فَسَبِّحْهُ وَإِدْبَارَ النُّجُومِ ﴿٤٩﴾

سُورَةُ النَّجْمِ

(٣٢) ئایا پیاوە ژیرەکانیان پێیان دەڵێت: ئەو قسە ناڕەوایانە بکەن، نەخێر ئەمانە هەر خۆیان کەسانێکی ستەمکارن؟

(٣٣) یان دەڵێن: ئەم قورئانە خۆی هەڵیبەستووەو دایڕشتووە، نەخێر ئەوانە، هەر ئیمان و باوەڕیان نیە (ئەگینا چۆن وا دەڵێن).

(٣٤) (دەی کەواتە خۆ ئەوانیش قسەزان و لێزانن) دەبا فەرمایشتێکی ئاوا وەک ئەم قورئانە بهێنن ئەگەر راست دەکەن؟!

(٣٥) ئایا ئەوانە بەبێ هیچ شتێک، هیچ هۆیەک، هاتوونەتە کایەوە؟! یان هەر خۆیان دروستکارن؟!

(٣٦) یان ئەو بێباوەڕانە ئاسمانەکان و زەویان دروستکردووە؟ نەخێر ئەوانە هەر دڵنیا نابن .

(٣٧) یان ئەوەیە گەنجینەی رزق و رۆزیەکانی پەروەردگاری تۆیان بەدەستە؟! یان ئەوەیە دەسەڵاتیان بێسنوورە؟ (تا ئاوا بوێرن لە خوا یاخی بن؟)

(٣٨) یان ئەوانە پەیژەیان هەیەو پیایدا سەردەکەون، تا گوێ لە نهێنیەکانی ئاسمان بگرن؟! دەبا گوێگرەکانیان بەڵگەیەکی ئاشکرا پەیدا بکەن (ئەوسا ملەجەڕێ بکەن).

(٣٩) ئایا ئەوە راستە کە کچان، ئەوەی خوابن و کوڕانیش ئەوەی ئێوە؟! (بەمەرجێک خۆیان لەکچان بێزاربوون، بەڵام بۆ خوا بە رەوایان بینیوە؟!)

(٤٠) یان ئەوەیە داوای کرێ و پارەیان لێ دەکەیت، تا بارێکی گران بدەی بە کۆڵیانداو پێیان هەڵنەسوڕێت!!

(٤١) یان ئەوەیە کە نهێنی و شاراوەکان لای ئەوانە و، ئەوان یاداشتی خەڵکی دەنووسن، (یان ئەوان بڕیاری بەسەرهاتەکان دەدەن)؟!

(٤٢) یان ئەوانە دەیانەوێت پیلان و تەڵەکەیەک رێک بخەن (دژی پێغەمبەر و ئیمانداران، بەڵام خەیاڵیان خاوە) ئەوانەی کە کافروخوانەناسن هەر خۆیان کەوتوونەتە ناو پیلانەوە و بون بە تەڵەی خۆیانەوە، پیلانەکانیان بەسەر خۆیاندا شکاوەتەوە.

(٤٣) یان ئەوانە وابیردەکەنەوە کە خوایەکی تریان جگە لە ( اللّٰهُ) هەیە؟! پاکی و بێگەردی بۆ خوا (لە بیروباوەڕی چەوتیان)، لەو شتانەی کە ئەوان دەیکەنە هاوەڵ بۆ خوا.

(٤٤) خۆ ئەگەر (لە سەرئەنجامی لادان و بیروباوەڕی چەوتیان و کاری ناردوستیان خوای گەورە سزایەکیان بۆ بنێرێت)و پارچە (ئەستێرەیەکیان) تێبگرێت و روو بەزەوی دابەزێت ئەو نەفامانە دەڵێن: هیچ نیە!! پەڵە هەورە و نیشتۆتە سەریەک!!

(٤٥) وازیان لێ بهێنە هەتا بەو رۆژە دەگەن کە تیایدا تیادەچن و لاڵ و پاڵ دەکەون.

(٤٦) ئەو رۆژە ئیتر فێڵ و تەڵەکەیان بەهیچ جۆرێک فریایان ناکەوێت و سەرکەوتو سەرفراز نابن.

(٤٧) بێگومان بۆ ئەوانەی کە ستەمیان کردووە سزای تریش هەیە بێجگە لەوەی کە جارجار بۆیان پێش دێت پێش تیاچوونی یەکجاری، بەڵام زۆربەیان نافامن و نازانن (هەست بەدەستی قەدەر ناکەن لە رووداوەکاندا).

(٤٨) ئەی پێغەمبەر ﷺ خۆگربە لە بەرامبەر بەجێهێنانی فەرمانی پەروەردگارتەوە، دڵنیابە کە تۆ لە ژێر چاودێری ئێمەدایت، هەروەها تەسبیحات و ستایش و سوپاسگوزاری پەروەردگارت بکە کاتێک کە بەرەبەیان هەڵدەسێت.

(٤٩) لە شەوگاریشدا هەر بیپەرستە و ستایشی بکە، هەروەها کاتێک ئەستێرەکان ون دەبن لە چاو دیار نامێنن.

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

وَالنَّجْمِ إِذَا هَوَىٰ ﴿١﴾ مَا ضَلَّ صَاحِبُكُمْ وَمَا غَوَىٰ ﴿٢﴾ وَمَا يَنطِقُ عَنِ الْهَوَىٰ ﴿٣﴾ إِنْ هُوَ إِلَّا وَحْيٌ يُوحَىٰ ﴿٤﴾ عَلَّمَهُ شَدِيدُ الْقُوَىٰ ﴿٥﴾ ذُو مِرَّةٍ فَاسْتَوَىٰ ﴿٦﴾ وَهُوَ بِالْأُفُقِ الْأَعْلَىٰ ﴿٧﴾ ثُمَّ دَنَا فَتَدَلَّىٰ ﴿٨﴾ فَكَانَ قَابَ قَوْسَيْنِ أَوْ أَدْنَىٰ ﴿٩﴾ فَأَوْحَىٰ إِلَىٰ عَبْدِهِ مَا أَوْحَىٰ ﴿١٠﴾ مَا كَذَبَ الْفُؤَادُ مَا رَأَىٰ ﴿١١﴾ أَفَتُمَارُونَهُ عَلَىٰ مَا يَرَىٰ ﴿١٢﴾ وَلَقَدْ رَآهُ نَزْلَةً أُخْرَىٰ ﴿١٣﴾ عِندَ سِدْرَةِ الْمُنتَهَىٰ ﴿١٤﴾ عِندَهَا جَنَّةُ الْمَأْوَىٰ ﴿١٥﴾ إِذْ يَغْشَى السِّدْرَةَ مَا يَغْشَىٰ ﴿١٦﴾ مَا زَاغَ الْبَصَرُ وَمَا طَغَىٰ ﴿١٧﴾ لَقَدْ رَأَىٰ مِنْ آيَاتِ رَبِّهِ الْكُبْرَىٰ ﴿١٨﴾ أَفَرَأَيْتُمُ اللَّاتَ وَالْعُزَّىٰ ﴿١٩﴾ وَمَنَاةَ الثَّالِثَةَ الْأُخْرَىٰ ﴿٢٠﴾ أَلَكُمُ الذَّكَرُ وَلَهُ الْأُنثَىٰ ﴿٢١﴾ تِلْكَ إِذًا قِسْمَةٌ ضِيزَىٰ ﴿٢٢﴾ إِنْ هِيَ إِلَّا أَسْمَاءٌ سَمَّيْتُمُوهَا أَنتُمْ وَآبَاؤُكُم مَّا أَنزَلَ اللَّهُ بِهَا مِن سُلْطَانٍ ۚ إِن يَتَّبِعُونَ إِلَّا الظَّنَّ وَمَا تَهْوَى الْأَنفُسُ ۖ وَلَقَدْ جَاءَهُم مِّن رَّبِّهِمُ الْهُدَىٰ ﴿٢٣﴾ أَمْ لِلْإِنسَانِ مَا تَمَنَّىٰ ﴿٢٤﴾ فَلِلَّهِ الْآخِرَةُ وَالْأُولَىٰ ﴿٢٥﴾ ۞ وَكَم مِّن مَّلَكٍ فِي السَّمَاوَاتِ لَا تُغْنِي شَفَاعَتُهُمْ شَيْئًا إِلَّا مِن بَعْدِ أَن يَأْذَنَ اللَّهُ لِمَن يَشَاءُ وَيَرْضَىٰ ﴿٢٦﴾



سوورەتی (النـجـم)

بەناوی خوای بەخشندە و میهرەبان

(١) سوێند بە ئەستێرە کاتێک لە شوێنی خۆی دەترازێت و بەخێرایی بەرەو بێتەوە و ئاوا دەبێت.

(٢) هاوەڵ وهاوڕێی ئێوە محمد ﷺ گومڕاو سەرلێشێواو نەبووە، لە ڕێگەی ڕاست و ڕەوان نەترازاوە.

(٣) قسەو گوفتاریشی (ئەوەی کە قورئانە) لە ئارەزوو بازی و هەواو هەوەسەوە نیە.

(٤) ئەمەی کە رای دەگەیەنێت تەنها نیگاو وەحی خواییە.

(٥) جوبرەئیلی فریشتە خاوەنی هێزو توانایی زۆر، قورئانی فێر کردووە.

(٦) ئەو جوبرەئیلەی کە خاوەنی بیرو هۆشێکی زۆر بەهێزو دیمەنێکی جوان بوو ئینجا لەسەر شێوە ڕاستەقینەکەی خۆی وەستا.

(٧) لەکاتێکدا لە ئاسۆی هەرە بەرزو بڵندەوە سەری هەڵدابوو، ئاسۆی پڕکردبوو.

(٨) لەوەودوا تا دەهات نزیک دەبۆوە و سەرەنجام هاتە خوارەوە بۆ لای پێغەمبەر ﷺ.

(٩) ئەوەندە لێی نزیک بۆوە ئێوانیان بەقەدەر دووکەوان یان کەمتریش بوو.

(١٠) ئینجا خوا لەڕێگەی ئەوەوە، نیگای کرد بۆ بەندەی خۆی، ئای چ نیگایەک بوو!

(١١) ئەوسا ئەوەی کە بەچاوی سەری بینی، لە ناخ و دەروونیەوە بڕوای پێی هەبوو، ناخ و دەروونی ڕاستیەکانی بەدرۆنەدەزانی.

(١٢) جا ئایا ڕاستە؟ ئێوە موجادەلەی لەگەڵدا دەکەن لەسەر شتێک کە ئەو دڵنیایە لە دیتنی؟

(١٣) سوێند بەخوا بێگومان جارێکی تریش لە دابەزینێکی تردا جوبرەئیلی بینیووە (کاتێک هاتووە بیبات بۆ شەوڕەوی).

(١٤) لەکاتێکدا لە(سدرة المنتهى) دا بوو.

(١٥) کە لەوێدا بەهەشتی (مأوى) هەیە بە واتای لانە و جێگەی حەوانەوە.

(١٦) کاتێک ئەوەی ـ سدرە ـ ی داپۆشی مەگەر هەر خوا خۆی بزانێت کێن و چین و کاریان چیە...

(١٧) جا بینینی ئەو بەدیهێنراوانە لەو شەوەدا وەنەبێت چاوبەست لە پێغەمبەر کرابێت و چاوی لێ لادا بێت.

(١٨) بێگومان پێغەمبەر ﷺ لەو شەوەدا لە بەڵگە و نیشانە و موعجیزە گەورەکانی پەروەردگاری بینیووە، بەچاوی سەری، بە هەموو هەستی..

(١٩) جا هەواڵم بدەنێ دەربارەی لات و عوززا و(دوودانە بتی ناشرین و ئێسک تاڵی دروستکراو)!

(٢٠) مەناتی سێهەمیش!! (ئەویش بتێکی ترە، ئایا دەسەڵاتیان هەیە).

(٢١) ئایا ڕەوایە کوڕان بۆ خۆتان وکچان بۆ خوا بە چاک بزانن (خوای گەورە دەیەوێت بەعەقڵی چەوتیان ڕەخنەیان لێبگرێت، ئەگینا کوڕو کچ هەردووک دروستکراوی خوان و پێوەری ڕێز تەنها خواناسی و پارێزکاریە).

(٢٢) ئەگەر وابێت ئەو کاتە ئەو دابەشکردن و بڕیارەتان زۆر دوورە لە دادپەروەریەوە و لە سنوور ترازانە.

(٢٣) ئەم بت و پەیکەرانە تەنها شتێکە کە خۆتان و باوو باپیرانتان ناوتان لێناون و هیچی تر نین، خوا بەڵگەیەکی نەناردووە لەسەر ڕەوا بوونیان، سەیرە، ئەوانە تەنها شوێنی گومان و ئارەزوی دەروونە نەخۆشەکانیان دەکەون، لەکاتێکدا کە بەڕاستی لەلایەن پەروەردگاریانەوە هیدایەت و ڕێنموییان پێگەیشتووە!

(٢٤) نەخێر بۆ ئادەمیزاد نیە ئەوەی داوای دەکات، (چونکە ئاواتەکانی نایەتە دی لە دنیادا)؟!

(٢٥) کەواتە هەر خوایە خاوەنی دنیا و قیامەت. (ئەی بۆ هەوڵی بەدەستهێنانی ڕەزامەندی ئەو زاتە نادەن ؟)

(٢٦) زۆر فریشتەش لە ئاسمانەکاندا هەن کە تکاو پاڕانەوەیان ناکام و بێسوودە، مەگەر خوا مۆڵەت بدات بۆ هەرکەسێک کە شایستەیە و ڕازی بێت کە تکا بکات، یان تکای بۆ بکرێت.

إِنَّ ٱلَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ بِٱلْآخِرَةِ لَيُسَمُّونَ ٱلْمَلَٰٓئِكَةَ تَسْمِيَةَ ٱلْأُنثَىٰ ﴿٢٧﴾ وَمَا لَهُم بِهِۦ مِنْ عِلْمٍ ۖ إِن يَتَّبِعُونَ إِلَّا ٱلظَّنَّ ۖ وَإِنَّ ٱلظَّنَّ لَا يُغْنِى مِنَ ٱلْحَقِّ شَيْـًٔا ﴿٢٨﴾ فَأَعْرِضْ عَن مَّن تَوَلَّىٰ عَن ذِكْرِنَا وَلَمْ يُرِدْ إِلَّا ٱلْحَيَوٰةَ ٱلدُّنْيَا ﴿٢٩﴾ ذَٰلِكَ مَبْلَغُهُم مِّنَ ٱلْعِلْمِ ۚ إِنَّ رَبَّكَ هُوَ أَعْلَمُ بِمَن ضَلَّ عَن سَبِيلِهِۦ وَهُوَ أَعْلَمُ بِمَنِ ٱهْتَدَىٰ ﴿٣٠﴾ وَلِلَّهِ مَا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِى ٱلْأَرْضِ لِيَجْزِىَ ٱلَّذِينَ أَسَٰٓـُٔوا۟ بِمَا عَمِلُوا۟ وَيَجْزِىَ ٱلَّذِينَ أَحْسَنُوا۟ بِٱلْحُسْنَى ﴿٣١﴾ ٱلَّذِينَ يَجْتَنِبُونَ كَبَٰٓئِرَ ٱلْإِثْمِ وَٱلْفَوَٰحِشَ إِلَّا ٱللَّمَمَ ۚ إِنَّ رَبَّكَ وَٰسِعُ ٱلْمَغْفِرَةِ ۚ هُوَ أَعْلَمُ بِكُمْ إِذْ أَنشَأَكُم مِّنَ ٱلْأَرْضِ وَإِذْ أَنتُمْ أَجِنَّةٌ فِى بُطُونِ أُمَّهَٰتِكُمْ ۖ فَلَا تُزَكُّوٓا۟ أَنفُسَكُمْ ۖ هُوَ أَعْلَمُ بِمَنِ ٱتَّقَىٰٓ ﴿٣٢﴾ أَفَرَءَيْتَ ٱلَّذِى تَوَلَّىٰ ﴿٣٣﴾ وَأَعْطَىٰ قَلِيلًا وَأَكْدَىٰٓ ﴿٣٤﴾ أَعِندَهُۥ عِلْمُ ٱلْغَيْبِ فَهُوَ يَرَىٰٓ ﴿٣٥﴾ أَمْ لَمْ يُنَبَّأْ بِمَا فِى صُحُفِ مُوسَىٰ ﴿٣٦﴾ وَإِبْرَٰهِيمَ ٱلَّذِى وَفَّىٰٓ ﴿٣٧﴾ أَلَّا تَزِرُ وَازِرَةٌ وِزْرَ أُخْرَىٰ ﴿٣٨﴾ وَأَن لَّيْسَ لِلْإِنسَٰنِ إِلَّا مَا سَعَىٰ ﴿٣٩﴾ وَأَنَّ سَعْيَهُۥ سَوْفَ يُرَىٰ ﴿٤٠﴾ ثُمَّ يُجْزَىٰهُ ٱلْجَزَآءَ ٱلْأَوْفَىٰ ﴿٤١﴾ وَأَنَّ إِلَىٰ رَبِّكَ ٱلْمُنتَهَىٰ ﴿٤٢﴾ وَأَنَّهُۥ هُوَ أَضْحَكَ وَأَبْكَىٰ ﴿٤٣﴾ وَأَنَّهُۥ هُوَ أَمَاتَ وَأَحْيَا ﴿٤٤﴾

(٢٧) بێگومان ئەوانەی کە باوەڕ بە قیامەت و لێپرسینەوە ناهێنن ناوی ئافرەت دەنێن لە فریشتەکان، (لەحاڵێکدا فریشتەکان دروستکراوانێکی تایبەتن).

(٢٨) ئەوانە لەو بارەیەوە هیچ جۆرە زانستی و زانیاریەکیان نیە، بەڵکو هەر شوێنی گومانی بێ سەرو بن دەکەون، لەکاتێکدا کە گومان بەهیچ شێوەیەک جێگەی حەق و راستی ناگرێتەوە.

(٢٩) گوێ مەدە بەو کەسەی کە یاخی بووە لە یادو بەرنامەی ئێمە، مەبەستیشی نەبووە تەنها ژیانی دنیایە نەبێت.

(٣٠) ئەوانە، هەر ئەوەندەی لێ دەزانن و عەقڵیان هەر ئەوەندە دەبڕێت، بەڕاستی هەر پەروەردگاری تۆیە کەچاک دەزانێت کێ لە ڕێبازەکەی لایداوە وگومڕایە، کێیش ڕێبازی ئیمان وهیدایەتی گرتۆتەبەر و شایستەی ڕێزە

(٣١) هەرچی لە ئاسمانەکان و زەویدا هەیە هەر خوا خاوەنیانە، (تاقیتان دەکاتەوە) بۆ ئەوەی تۆڵەبسێنێت لەوانەی کە خراپەیان کردووە بەگوێرەی کردەوەکانیان، پاداشتی ئەوانەش کە چاکەیان کردووە بەچاکترین شێوە بداتەوە.

(٣٢) ئەوانەی کە خۆیان دەپارێزن لە گوناهو تاوانە گەورەکان لە گوفتارو کرداری بەد جگە لە وردە گوناهان، بەڕاستی پەروەردگاری تۆ ئەی پێغەمبەر ﷺ، ئەی ئیماندار چاوپۆشی زۆر فراوانە، چاک دەتانناسێت، لەکاتێکدا ئێوەی لە زەویدا بەرپاکردووە، لەو کاتەشدا ئێوە کۆرپەلەی بچووک بوون لە سکی دایکتاندا (ئاگای لێتان بوو)، کەواتە خۆتان بەچاک مەزانن و خۆتان بە پاڵفتە دامەنێن، هەر خوا خۆی دەزانێت کێ تەقوای هەیە و پارێزکارە.

(٣٣) جا هەواڵم بدەرێ ئایا ئەوەی پشتی لە باوەڕ هەڵکرد ...

(٣٤) کەمێکیشی بەخشی و خێرا دەستی گرتەوە ...

(٣٥) ئایا ئەو جۆرە کەسانە زانستی و نهێنی دەزانن و ئاگاداری شاراوەکانن و دەیبینن ؟!

(٣٦) ئایا ئاگادار نەکرابوو بەوەی لە پەڕاوەکانی موسادا بوو؟

(٣٧) یان ئەو ئیبراهیمەی کە هەموو پەیمانەکانی بەجێ هێنا بەتەواوی ؟!

(٣٨) (لەو پەڕاوو کتێبە پیرۆزانەدا هاتووە): کە هیچ گوناهبارێک گوناهی تاوانبارێکی تر هەڵناگرێت.

(٣٩) بەڕاستی ئادەمیزاد خاوەنی هیچ شتێک نی‌یە تەنها ئەوە نەبێت کە خۆی کردوویەتی.

(٤٠) بێگومان هەوڵ و کۆششەکەی دەبینرێتەوە لە قیامەتدا.

(٤١) پاشان پاداشت دەدرێتەوە بەتێرو تەسەلی.

(٤٢) بەڕاستی و دڵنیاییەوە دەڵێین: کە کۆتایی ئەم ڕێگوزەرە لە لای پەروەردگارتەوە سەرهەڵ دەدات.

(٤٣) بێگومان هەر ئەو زاتەش دیاردەی پێکەنین و گریانی لە ئادەمیزادا بەدیهێناوە.

(٤٤) هەروەها هەر خۆی دیاردەی مردن وژیانی دروست کردووە.

وَأَنَّهُۥ خَلَقَ ٱلزَّوْجَيْنِ ٱلذَّكَرَ وَٱلْأُنثَىٰ ﴿٤٥﴾ مِن نُّطْفَةٍ إِذَا تُمْنَىٰ ﴿٤٦﴾ وَأَنَّ عَلَيْهِ ٱلنَّشْأَةَ ٱلْأُخْرَىٰ ﴿٤٧﴾ وَأَنَّهُۥ هُوَ أَغْنَىٰ وَأَقْنَىٰ ﴿٤٨﴾ وَأَنَّهُۥ هُوَ رَبُّ ٱلشِّعْرَىٰ ﴿٤٩﴾ وَأَنَّهُۥٓ أَهْلَكَ عَادًا ٱلْأُولَىٰ ﴿٥٠﴾ وَثَمُودَا۟ فَمَآ أَبْقَىٰ ﴿٥١﴾ وَقَوْمَ نُوحٍ مِّن قَبْلُ ۖ إِنَّهُمْ كَانُوا۟ هُمْ أَظْلَمَ وَأَطْغَىٰ ﴿٥٢﴾ وَٱلْمُؤْتَفِكَةَ أَهْوَىٰ ﴿٥٣﴾ فَغَشَّىٰهَا مَا غَشَّىٰ ﴿٥٤﴾ فَبِأَىِّ ءَالَآءِ رَبِّكَ تَتَمَارَىٰ ﴿٥٥﴾ هَٰذَا نَذِيرٌ مِّنَ ٱلنُّذُرِ ٱلْأُولَىٰٓ ﴿٥٦﴾ أَزِفَتِ ٱلْءَازِفَةُ ﴿٥٧﴾ لَيْسَ لَهَا مِن دُونِ ٱللَّهِ كَاشِفَةٌ ﴿٥٨﴾ أَفَمِنْ هَٰذَا ٱلْحَدِيثِ تَعْجَبُونَ ﴿٥٩﴾ وَتَضْحَكُونَ وَلَا تَبْكُونَ ﴿٦٠﴾ وَأَنتُمْ سَٰمِدُونَ ﴿٦١﴾ فَٱسْجُدُوا۟ لِلَّهِ وَٱعْبُدُوا۟ ۩ ﴿٦٢﴾




بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

ٱقْتَرَبَتِ ٱلسَّاعَةُ وَٱنشَقَّ ٱلْقَمَرُ ﴿١﴾ وَإِن يَرَوْا۟ ءَايَةً يُعْرِضُوا۟ وَيَقُولُوا۟ سِحْرٌ مُّسْتَمِرٌّ ﴿٢﴾ وَكَذَّبُوا۟ وَٱتَّبَعُوٓا۟ أَهْوَآءَهُمْ ۚ وَكُلُّ أَمْرٍ مُّسْتَقِرٌّ ﴿٣﴾ وَلَقَدْ جَآءَهُم مِّنَ ٱلْأَنۢبَآءِ مَا فِيهِ مُزْدَجَرٌ ﴿٤﴾ حِكْمَةٌۢ بَٰلِغَةٌ ۖ فَمَا تُغْنِ ٱلنُّذُرُ ﴿٥﴾ فَتَوَلَّ عَنْهُمْ ۘ يَوْمَ يَدْعُ ٱلدَّاعِ إِلَىٰ شَىْءٍ نُّكُرٍ ﴿٦﴾

(٤٥) هەر ئەو زاتەش دوو جۆری دروست کردووە کە نێرو مێیە ...

(٤٦) لە نوتفەیەک (لە خاڵێکی زۆر بچووک، ئەویش ئەگەر ویستی خوای لەسەربێت) کاتێک لە جێی خۆیدا دادەنرێت .

(٤٧) بێگومان لەسەر خوایشە دروست کردنەوەکەی تریش.

(٤٨) دەوڵەمەندی و ئەوەی پێویست بێت دەیبەخشێت.

(٤٩) هەر خوایش پەروەردگاری شیعرایە: (ئەستێرەیەکە هەندێ لە عەرەبەکان پەرستویانە، قەبارەکەی دە، ئەوەندەی خۆرە، یەک ملیۆن ئەوەندەی نێوان زەوی و خۆر لێمانەوە دوورە..)

(٥٠) هەر ئەو زاتەش قەومی عادی یەکەمی لەناو برد.

(٥١) ثەمودیشی لەناو برد و هیچی نەهێشتن.

(٥٢) زووتریش قەومی نوحی لەناو برد کە بێگومان ئەوانیش ستەمکارترو سەرکەشتر بوون.

(٥٣) هەر ئەو زاتە تاوانباران و شەرواڵ پیسانیشی ژێرەو ژوورکرد ...

(٥٤) ئینجا ئەو دێهاتانەی داپۆشی ئەوەی کە دای پۆشی.(بە بەرد باران).

(٥٥) جا ئیتر ئەی بێ ئیمان تۆ لەکام یەک لە نازو نیعمەتەکانی خوا دوودڵیت..

(٥٦) ئەم پێغەمبەرەش هۆشیارکەرەوەیەکە لە هۆشیارکەرەوانی پێشوو.

(٥٧) (ئەوە چاک بزانن) قیامەت و لێپرسینەوە نزیک بووەتەوە (نزیکە بە نیسبەت هەر ئادەمیزادێکەوە هەر کە مرد ئەوە قیامەت لەو بەرپا بووە، قیامەتی گەورەش کاتێک بەرپا دەبێت هەمووان واهەست دەکەن کە چەند سەعات لەوەوپێش دنیا بوو وا ئێستەش قیامەتە)!!

(٥٨) کەسیش ناتوانێت ئەو رۆژە دەربخات و بەرپای بکات جگە لە خوای بەدەسەڵات و باڵادەست.

(٥٩) جا ئایا ئێوە لەم قسەیە کە قورئانە سەرسام دەبن ؟!

(٦٠) پێ دەکەنن و گریانتان نایەت (بۆ ئەو چارەنووسە رەشەی کە چاوەڕێتانە).

(٦١) ئێوە بەردەوام سەرگەرمی رابواردنن و بێ هۆشن ؟!

(٦٢) (دەی کەواتە بێداربنەوە و داچڵەکێن) کەواتە سوژدە بۆ خوای بەدیهێنەر ببەن، هەر ئەویش بپەرستن.

سوورەتی (القمر)

بەناوی خوای بەخشندە و میهرەبان

(١) رۆژی قیامەت نزیک بۆتەوە و مانگیش لەت بوو، (هەندێ روایات هەیە کە ئاماژە دەکات بۆ ئەوەی کە: خوانەناسان داوای موعجیزەیان لە پێغەمبەر کردبێت ئەویش پەنجەی موبارەکی رووەو مانگ بزواندو بە ویستی خوا لەت بوو) بەڵام هەندێک لە موفەسرین دەڵێن: ئەم رووداوە لەسەرەتای بەرپابونی قیامەتدا پێش دێت.

(٢) خۆ ئەگەر ئەوانە هەر موعجیزە و بەڵگەیەک ببینن پشت هەڵدەکەن و دەڵێن: ئەمە جادوویەکی بەردەوامە.

(٣) حەقیقەت و راستی بەدرۆدەزانن و شوێنی ئارەزووەکانیان کەوتوون، لەکاتێکدا هەموو شت تەواو دەبێت و، هەموو کارێک کۆتایی دێت و دنیا تەواو دەبێت و بە بەرپابونی قیامەت لەنگەر دەگرێت.

(٤) بێگومان ئەوەندە هەواڵی تیاچوونی ستەمکارانیان پێگەیشتووە تا داچڵەکێن (تێفکرن و لە چەوتی دەست هەڵگرن).

(٥) ئەو بەسەرهاتانە حیکمەت و پەند و ئامۆژگاری زۆری تێدایە، بەڵام بۆ ئەوانە بێدارکردنەوە بێسوودە.

(٦) گوێ مەدە بەناپوختی ئەوانە رۆژێک دێت کە بانگ وێژێک بانگ دەکات بۆ بارودۆخێکی زۆر ناخۆش و ناڵەبار.



خُشَّعًا أَبْصَٰرُهُمْ يَخْرُجُونَ مِنَ ٱلْأَجْدَاثِ كَأَنَّهُمْ جَرَادٌ مُّنتَشِرٌ ﴿٧﴾ مُّهْطِعِينَ إِلَى ٱلدَّاعِ يَقُولُ ٱلْكَٰفِرُونَ هَٰذَا يَوْمٌ عَسِرٌ ﴿٨﴾ كَذَّبَتْ قَبْلَهُمْ قَوْمُ نُوحٍ فَكَذَّبُوا۟ عَبْدَنَا وَقَالُوا۟ مَجْنُونٌ وَٱزْدُجِرَ ﴿٩﴾ فَدَعَا رَبَّهُۥٓ أَنِّى مَغْلُوبٌ فَٱنتَصِرْ ﴿١٠﴾ فَفَتَحْنَآ أَبْوَٰبَ ٱلسَّمَآءِ بِمَآءٍ مُّنْهَمِرٍ ﴿١١﴾ وَفَجَّرْنَا ٱلْأَرْضَ عُيُونًا فَٱلْتَقَى ٱلْمَآءُ عَلَىٰٓ أَمْرٍ قَدْ قُدِرَ ﴿١٢﴾ وَحَمَلْنَٰهُ عَلَىٰ ذَاتِ أَلْوَٰحٍ وَدُسُرٍ ﴿١٣﴾ تَجْرِى بِأَعْيُنِنَا جَزَآءً لِّمَن كَانَ كُفِرَ ﴿١٤﴾ وَلَقَد تَّرَكْنَٰهَآ ءَايَةً فَهَلْ مِن مُّدَّكِرٍ ﴿١٥﴾ فَكَيْفَ كَانَ عَذَابِى وَنُذُرِ ﴿١٦﴾ وَلَقَدْ يَسَّرْنَا ٱلْقُرْءَانَ لِلذِّكْرِ فَهَلْ مِن مُّدَّكِرٍ ﴿١٧﴾ كَذَّبَتْ عَادٌ فَكَيْفَ كَانَ عَذَابِى وَنُذُرِ ﴿١٨﴾ إِنَّآ أَرْسَلْنَا عَلَيْهِمْ رِيحًا صَرْصَرًا فِى يَوْمِ نَحْسٍ مُّسْتَمِرٍّ ﴿١٩﴾ تَنزِعُ ٱلنَّاسَ كَأَنَّهُمْ أَعْجَازُ نَخْلٍ مُّنقَعِرٍ ﴿٢٠﴾ فَكَيْفَ كَانَ عَذَابِى وَنُذُرِ ﴿٢١﴾ وَلَقَدْ يَسَّرْنَا ٱلْقُرْءَانَ لِلذِّكْرِ فَهَلْ مِن مُّدَّكِرٍ ﴿٢٢﴾ كَذَّبَتْ ثَمُودُ بِٱلنُّذُرِ ﴿٢٣﴾ فَقَالُوٓا۟ أَبَشَرًا مِّنَّا وَٰحِدًا نَّتَّبِعُهُۥٓ إِنَّآ إِذًا لَّفِى ضَلَٰلٍ وَسُعُرٍ ﴿٢٤﴾ أَءُلْقِىَ ٱلذِّكْرُ عَلَيْهِ مِنۢ بَيْنِنَا بَلْ هُوَ كَذَّابٌ أَشِرٌ ﴿٢٥﴾ سَيَعْلَمُونَ غَدًا مَّنِ ٱلْكَذَّابُ ٱلْأَشِرُ ﴿٢٦﴾ إِنَّا مُرْسِلُوا۟ ٱلنَّاقَةِ فِتْنَةً لَّهُمْ فَٱرْتَقِبْهُمْ وَٱصْطَبِرْ ﴿٢٧﴾

(٧) خوانەناسان چاویان شۆڕەو شەرمەزارن، لە ناخی زەویەوە دێنە دەرەوە، هەروەکێ لێشاوی کوللـەی زۆر (رووکاری زەوی دادەپۆشن).

(٨) زۆر بەپەلەو بەشپرزەییەوە بەدەم بانگێ هێشتی کۆکردنەوەیانەوە دەچن، کـافرو خوانەناسـان بەیـەکتر دەڵێن: وا دیارە ئەمڕۆ ڕۆژێکی زۆر گران و سەختە.

(٩) پێش ئەمانیش قەومی نوح بڕوایـان بـە بـەندەی بـەڕێزی ئێمـە نـەکردو وتیـان: شـێتە، زۆریـش پیاهەڵشاخان و دژایەتی کرا.

(١٠) ئەویش دوای (٩٥٠ ساڵ) هاناو هـاواری بـۆ پەروەردگاری بردو وتی: خوایە؛ بەڕاستی من شکستم خواردووە و سەرکەوتنم پێببەخشە.

(١١) ئەوسا ئیتر ئێمە دەروازەکانی ئاسمانـمان هاوڕێ لەگەڵ ئاوێکی خوڕدا کردەوە.

(١٢) هەموو زەویشمان کرد بـەکانیاو و ئاومـان لێ هەڵقوڵاند، ئیـتر ئـاوی ئاسمـان و زەوی بـە تـەقدیرو ویستی خوا بەیەکێ گەیشتن، بەڕاستی بڕیاری لەسـەر درابوو.

(١٣) ئەوسا نـوح مـان لەسـەر چـەند تەختـە و بزمارێکێ هەڵگرت (مەبەست کەشتیەکەیە).

(١٤) لەژێر چـاودێری خۆمـاندا (لـەناو ئـەو زریانـە سامناکەدا) دەهات و دەچـوو، ئـا بـەو شـێوەیە پاداشتی ئەو کەسەمان دایەوە کـە بـڕوای پـێ نـەکرا (واتە نوح) .

(١٥) بەڕاستی ئێمە ئەم بەسەرهاتەمان هێشتەوە بە بەڵگە بۆ هەموو نەوەکان .. ئایا کەسـێکێ هەیـە کـە پەندو ئامۆژگاری لێ وەربگرێت؟!

(١٦) سەرنج بـدەن چۆن بـوو سزاو تۆڵـەو خەشم و قینی من لەو یاخی بووانە؟

(١٧) بێگومان ئێمە قورئانمان ئاسان کردووە بۆ (خوێندنەوە و تێگەیشتن و) ئامۆژگاری وەرگرتن، جا ئایا کەسـێک هەیـە کـە دەرکی حەقیقەت و ڕاستی بکات و پەندی وەرگرتبێت؟

(١٨) قەومی عادیش بڕوایان بەپێغەمبەرەکەیان نەکرد، جا سەرنج بدەو بزانە سزاو تۆڵەی ئێمە لەو یاخیبووانە چۆن بوو؟

(١٩) بێگومان ئێمە بایەکی بەردەوامی توندو سـەخت و ساردمان هـەڵکردە سـەریان لـە ڕۆژگـارێکی شـومدا (یـەکێ حەفتـەی خایاند).

(٢٠) خەڵکی هەمووی لە بێخ دەرهێنا و لە پێی خستن و دانی بەزەویدا، هەروەکو قەدی دارخورمای کلۆرو هەڵکەنراو.

(٢١) سەرنجی ئایەتی ١٦ بدە.

(٢٢) سەرنجی ئایەتی ١٧ بدە.

(٢٣) ثـمودیش هەموو بێدارکردنەوە و داچڵەکاندنێکیان بە درۆزانی و بڕوایان پێی نەبوو.

(٢٤) جا وتیان: باشە، ڕەوایە؛ ئێمە شوێنی تاکە کەسێکێ بکەوین لە خۆمان ؟!، ئێمە ئەگەر بـڕوا بەکەسـێکی وا بکـەین ، ئـەو کاتە ئێمە بەڕاستی لە گومڕایی و شێتیداین؟!

(٢٥) ئایا ڕاستە لە نێوان ئێمەدا وەحی و نیگا بۆ ئەو ڕەوانە کرابێت، نەخێر شـتی وا نـابێت، بـەڵکو ئـەو هـەر کابرایـەکی زۆر درۆزن و خۆپەرستە و حەز بەگەورەیی دەکات!!

(٢٦) سبەی دەزانن و بۆیان دەردەکەوێت کە کێ درۆزن و خۆپەرست وخۆ بەگەورە زانە .

(٢٧) بێگومان ئێمە ئەو وشترەی کە بیانوویان گرت، لە بـەرد پـەیدامان کـرد، بـەوەش تاقیمـان کردنـەوە، جـا ـ ئـەی صالح ـ چاودێریان بکە، بزانە چی دەکەن، خۆگرو ئارامگریش بە (لە بەرامبەر کاروکردەوەی ناشرینیانەوە).

وَنَبِّئْهُمْ أَنَّ ٱلْمَآءَ قِسْمَةٌۢ بَيْنَهُمْ ۖ كُلُّ شِرْبٍ مُّحْتَضَرٌ ﴿٢٨﴾ فَنَادَوْا۟ صَاحِبَهُمْ فَتَعَاطَىٰ فَعَقَرَ ﴿٢٩﴾ فَكَيْفَ كَانَ عَذَابِى وَنُذُرِ ﴿٣٠﴾ إِنَّآ أَرْسَلْنَا عَلَيْهِمْ صَيْحَةً وَٰحِدَةً فَكَانُوا۟ كَهَشِيمِ ٱلْمُحْتَظِرِ ﴿٣١﴾ وَلَقَدْ يَسَّرْنَا ٱلْقُرْءَانَ لِلذِّكْرِ فَهَلْ مِن مُّدَّكِرٍ ﴿٣٢﴾ كَذَّبَتْ قَوْمُ لُوطٍۭ بِٱلنُّذُرِ ﴿٣٣﴾ إِنَّآ أَرْسَلْنَا عَلَيْهِمْ حَاصِبًا إِلَّآ ءَالَ لُوطٍ ۖ نَّجَّيْنَٰهُم بِسَحَرٍ ﴿٣٤﴾ نِّعْمَةً مِّنْ عِندِنَا ۚ كَذَٰلِكَ نَجْزِى مَن شَكَرَ ﴿٣٥﴾ وَلَقَدْ أَنذَرَهُم بَطْشَتَنَا فَتَمَارَوْا۟ بِٱلنُّذُرِ ﴿٣٦﴾ وَلَقَدْ رَٰوَدُوهُ عَن ضَيْفِهِۦ فَطَمَسْنَآ أَعْيُنَهُمْ فَذُوقُوا۟ عَذَابِى وَنُذُرِ ﴿٣٧﴾ وَلَقَدْ صَبَّحَهُم بُكْرَةً عَذَابٌ مُّسْتَقِرٌّ ﴿٣٨﴾ فَذُوقُوا۟ عَذَابِى وَنُذُرِ ﴿٣٩﴾ وَلَقَدْ يَسَّرْنَا ٱلْقُرْءَانَ لِلذِّكْرِ فَهَلْ مِن مُّدَّكِرٍ ﴿٤٠﴾ وَلَقَدْ جَآءَ ءَالَ فِرْعَوْنَ ٱلنُّذُرُ ﴿٤١﴾ كَذَّبُوا۟ بِـَٔايَٰتِنَا كُلِّهَا فَأَخَذْنَٰهُمْ أَخْذَ عَزِيزٍ مُّقْتَدِرٍ ﴿٤٢﴾ أَكُفَّارُكُمْ خَيْرٌ مِّنْ أُو۟لَٰٓئِكُمْ أَمْ لَكُم بَرَآءَةٌ فِى ٱلزُّبُرِ ﴿٤٣﴾ أَمْ يَقُولُونَ نَحْنُ جَمِيعٌ مُّنتَصِرٌ ﴿٤٤﴾ سَيُهْزَمُ ٱلْجَمْعُ وَيُوَلُّونَ ٱلدُّبُرَ ﴿٤٥﴾ بَلِ ٱلسَّاعَةُ مَوْعِدُهُمْ وَٱلسَّاعَةُ أَدْهَىٰ وَأَمَرُّ ﴿٤٦﴾ إِنَّ ٱلْمُجْرِمِينَ فِى ضَلَٰلٍ وَسُعُرٍ ﴿٤٧﴾ يَوْمَ يُسْحَبُونَ فِى ٱلنَّارِ عَلَىٰ وُجُوهِهِمْ ذُوقُوا۟ مَسَّ سَقَرَ ﴿٤٨﴾ إِنَّا كُلَّ شَىْءٍ خَلَقْنَٰهُ بِقَدَرٍ ﴿٤٩﴾

(٢٨) هەواڵیشیان بدەرێ: کە ئاوەکە بەشکراوە (ڕۆژێک بۆ ئەوان و ماڵاتەکەیان، ڕۆژێکیش بۆ وشترەکە) ئیتر لە ڕۆژی نۆبەی وشترەکەدا هەموو بەکارهێنانێکی ئاوەکە قەدەغەیە لەوان.

(٢٩) (قەومی ناڵەبار لە تاقیکردنەوەکەدا سەرنەکەوتن وخۆیان بۆ نەگیرا لەبەرئەوە) بانگی زەلامێکی دڕیان کرد و هانیاندا بۆ سەربڕینی، ئەویش بێباکانە پەلاماری شمشێریداو سەری بڕی.

(٣٠) سەرنجی ئایەتی ١٦ بدە.

(٣١) ئەوسا ئێمەش بەیەک دەنگی بەهێزی سامناک (دڵی هەموویانمان پچڕاند) و وەک گژوگیای وشک (کە کۆدەکرێتەوە و ژێر پێ دەکەوێت) لەناومان بردن.

(٣٢) سەرنجی ئایەتی ١٧ بدە.

(٣٣) هۆزی لوطیش بڕوایان بە هیچ بێدار کردنەوەیەک نەکرد.

(٣٤) بێگومان ئێمە ئەوانیشمان بەرد باران کرد (هەروەها ژێرەو ژووریش کران)، جگە لە لوط و خاوو خێزانی ئیمانداری کە لە بەرەبەیاندا ڕزگارمان کردن.

(٣٥) ئەو ڕزگار کردنە نازو نیعمەتێکی تایبەتی بوو لە لایەن ئێمەوە، جا هەر ئاوا پاداشتی کەسێک دەدەینەوە کە سوپاسگوزاری کردبێت.

(٣٦) بەڕاستی لوط پێشتر ئاگاداری کردبوون (ئەگەر بەردەوام بن لەسەر بەد ڕەوشتیان)، لە تۆڵەی تونلوبەهێزی ئێمە، کەچی گومانیان هەبوو لەو ئاگاداریە و بڕوایان پێی نەبوو.

(٣٧) ئەوخەڵکە بەد ڕەوشتە چاویان بڕیبووە میوانەکانی و (دەیانویست دەستدرێژیان بکەنەسەر)، ئێمەش چاومان کوێرکردن، بینایمان لێسەندنەوە، دە بچێژن سزاو سەرەنجامی هوشیارکردنەوەی من.

(٣٨) بێگومان سەر لە بەیانیەکی زوو سزای تونلو بەئێش چوار دەوری گرتن و دایگرتن .

(٣٩) دە بچێژن سزاو سەرەنجامی هوشیارکردنەوەی من (ئەی بە دڕەوشت و ناپوختەکان).

(٤٠) سەرنجی ئایەتی ١٧ بدە.

(٤١) بێگومان بۆ فیرعەون و دەست و پێوەندیشی بێدارکەرەوەکان هاتن.

(٤٢) بڕوایان بە هەر هەموو نیشانە و بەڵگەکانی ئێمە نەکرد، ئەوسا ئیتر ڕاپێچیمان کردن و لەناومان بردن ئەویش بە دەستی قودرەتی خوایەکی باڵادەست و بەتوانا.

(٤٣) باشە.. ئایا کافرەکانی ئێوە ئازاترو چاکترن لە ئا ئەوانە کە لەناومان بردن؟ یان پەیمانتان دراوەتێ لە نامە ئاسمانیەکاندا کە تووشی ئەو بەڵایانە نابن کە باسکران؟

(٤٤) یان دەڵێن ئێمە هەمووومان کۆین و سەرکەوتووین و شکست ناهێنین.

(٤٥) لە ئاییندەیەکی نزیکدا لەشکرو کۆمەڵیان شکست دەهێنێت و هەڵدێن (لە غەزای بەدردا ئەو مژدەیە هاتە دی).

(٤٦) جگە لەوەش قیامەت کاتی لێ پرسینەوەیانە، کە ڕۆژێکی زۆر سەختترو تاڵ ترە.

(٤٧) بەڕاستی تاوانبارو تاوانکاران لە گومڕایی و شێتیەکی زۆردا ڕۆچوون.

(٤٨) ڕۆژێک دێت کە لەسەر ڕوویان ڕادەکێشرێن لەناو ئاگری دۆزەخدا، پێیان دەوترێت: دە بچێژن تاڵاوی دۆزەخ.

(٤٩) بێگومان ئێمە هەموو شتێکمان بە ئەندازەو نەخشەی دیاریکراو دروست کردووە.

وَمَآ أَمْرُنَآ إِلَّا وَٰحِدَةٌ كَلَمْحٍۭ بِٱلْبَصَرِ ﴿٥٠﴾ وَلَقَدْ أَهْلَكْنَآ أَشْيَاعَكُمْ فَهَلْ مِن مُّدَّكِرٍ ﴿٥١﴾ وَكُلُّ شَىْءٍ فَعَلُوهُ فِى ٱلزُّبُرِ ﴿٥٢﴾ وَكُلُّ صَغِيرٍ وَكَبِيرٍ مُّسْتَطَرٌ ﴿٥٣﴾ إِنَّ ٱلْمُتَّقِينَ فِى جَنَّٰتٍ وَنَهَرٍ ﴿٥٤﴾ فِى مَقْعَدِ صِدْقٍ عِندَ مَلِيكٍ مُّقْتَدِرٍۭ ﴿٥٥﴾

سُورَةُ الرَّحْمَٰن

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

ٱلرَّحْمَٰنُ ﴿١﴾ عَلَّمَ ٱلْقُرْءَانَ ﴿٢﴾ خَلَقَ ٱلْإِنسَٰنَ ﴿٣﴾ عَلَّمَهُ ٱلْبَيَانَ ﴿٤﴾ ٱلشَّمْسُ وَٱلْقَمَرُ بِحُسْبَانٍ ﴿٥﴾ وَٱلنَّجْمُ وَٱلشَّجَرُ يَسْجُدَانِ ﴿٦﴾ وَٱلسَّمَآءَ رَفَعَهَا وَوَضَعَ ٱلْمِيزَانَ ﴿٧﴾ أَلَّا تَطْغَوْا۟ فِى ٱلْمِيزَانِ ﴿٨﴾ وَأَقِيمُوا۟ ٱلْوَزْنَ بِٱلْقِسْطِ وَلَا تُخْسِرُوا۟ ٱلْمِيزَانَ ﴿٩﴾ وَٱلْأَرْضَ وَضَعَهَا لِلْأَنَامِ ﴿١٠﴾ فِيهَا فَٰكِهَةٌ وَٱلنَّخْلُ ذَاتُ ٱلْأَكْمَامِ ﴿١١﴾ وَٱلْحَبُّ ذُو ٱلْعَصْفِ وَٱلرَّيْحَانُ ﴿١٢﴾ فَبِأَىِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿١٣﴾ خَلَقَ ٱلْإِنسَٰنَ مِن صَلْصَٰلٍ كَٱلْفَخَّارِ ﴿١٤﴾ وَخَلَقَ ٱلْجَآنَّ مِن مَّارِجٍ مِّن نَّارٍ ﴿١٥﴾ فَبِأَىِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿١٦﴾



(٥٠) فەرمانی ئێمە تەنها یەکێ وشەیە دەڵێین ببە دەستبەجێ دەبێت وەکێ چاو تروکاندنێک.

(٥١) بێگومان ئێمە زۆر لەپێشینانی خوانەناسی وەکێ ئێوەمان لەناو بردوە، جا ئایا کەس هەیە دەرس و عیبرەت و پەندو ئامۆژگاری وەربگرێت؟

(٥٢) هەرچی کارو کردەوەیەکێ کە ئەنجامیان داوە لە (لوح المحفوظ) و لە لای فریشتە چاودێرەکان تۆمارکراوە.

(٥٣) هەرچی وردو درشت هەیە، لە کارو کردەوەیان نووسراوە و تۆمارکراوە.

(٥٤) بێگومان پارێزکاران و خواناسان لەناو باخ و روبارو تاڤگەکاندا ژیانی پڕ لە بەختیاری و کامەرانی هەمیشەیی دەبەنە سەر.

(٥٥) لە شوێنی راست و پەسەندان لای پادشای بەدەسەڵات .

سوورەتی (الرحمن)

بەناوی خوای بەخشندە و میهرەبان

(١) خوای میهرەبان، کانگای سۆزو رەحمەت.

(٢) قورئانی فێری ئادەمیزاد کردووە (فێربوون و زانینی قورئان و تێگەیشتن لە فەرموودەی خوای میهرەبان پیرۆزترین نازو نیعمەتە کە ئیماندار لێی بەهرەوەر ببێت لەم تەمەنە کورتەی ژیانی دنیادا ).

(٣) هەر خوا ئادەمیزادی دروست کردووە.

(٤) هەر ئەویش فێری گوفتارو ئاخاوتنی کردووە.

(٥) خۆرو مانگیشی بەحسابێکی ورد دروست کردوون ودایناون لەخولگەکانیاندا لە سوورانەوەدان.

(٦) ئەستێرە و درەختەکان، روەکە بێ قەدو درەختە بەرزەکان هەموویان، سوژدە دەبەن بۆ دروستکاریان (لە نەخشەی دیاری کراو دەرناچن کە بۆیان دانراوە).

(٧) ئاسمانیشی بەرزو بڵندکردۆتەوە (بێ کۆڵەکە و بێ ستوون) و تەرازوو پێوەری بۆهەموو شتێکێ داناوە (هەموو شت بەیاسایە و هیچ شتێکێ بە هەڕەمەکی و بەبێ هودە دروست نەکراوە، بۆیە، پێویستە ئادەمیزادیش بەرنامە و یاسای هەبێت لە چوارچێوەی قورئان و سووننەتی راست و دروستدا).

(٨) ئێوەش ئەی نەوەی ئادەم با تەرازوو پێوەرتان رێکوپێکێ بێت و ستەم لە یەکتر مەکەن.

(٩) دادپەروەر بن لە کێشان و پێواندا، تەرازوو بازیی مەکەن و کەم فرۆشی ئەنجام مەدەن.

(١٠) زەویشی بۆ خەڵکی راخستوە و باری هێناوە (تا ژیانی خۆیانی تیادا بەرنەسەر).

(١١) جۆرەها میوەی تێدا دێتە بەر، هەروەها خورمای خاوەن دەفری گوڵدانی بۆ فەراهەم هێناون.

(١٢) هەروەها جۆرەها دانەوێڵەی خاوەن کاو پەلوپۆدارو بۆنخۆشی تیادا بەرهەم هێناوە.

(١٣) جا ئیتر ئەی گرۆی ئادەمیزادو پەری بە کام لە نازو نیعمەتەکانی پەروەردگار بڕوا ناکەن، کامەی پەسەند ناکەن.

(١٤) ئادەمیزادی دروستکردووە لە قوڕێکی وشک بوو، وەکێ فەخفوری.

(١٥) پەریەکانیشی لە بڵێسەی ئاگر دروست کردووە.    (١٦) سەرنجی ئایەتی ١٣ بدە.

رَبُّ ٱلْمَشْرِقَيْنِ وَرَبُّ ٱلْمَغْرِبَيْنِ ﴿١٧﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿١٨﴾ مَرَجَ ٱلْبَحْرَيْنِ يَلْتَقِيَانِ ﴿١٩﴾ بَيْنَهُمَا بَرْزَخٌ لَّا يَبْغِيَانِ ﴿٢٠﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٢١﴾ يَخْرُجُ مِنْهُمَا ٱللُّؤْلُؤُ وَٱلْمَرْجَانُ ﴿٢٢﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٢٣﴾ وَلَهُ ٱلْجَوَارِ ٱلْمُنشَـَٔاتُ فِى ٱلْبَحْرِ كَٱلْأَعْلَٰمِ ﴿٢٤﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٢٥﴾ كُلُّ مَنْ عَلَيْهَا فَانٍ ﴿٢٦﴾ وَيَبْقَىٰ وَجْهُ رَبِّكَ ذُو ٱلْجَلَٰلِ وَٱلْإِكْرَامِ ﴿٢٧﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٢٨﴾ يَسْـَٔلُهُۥ مَن فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۚ كُلَّ يَوْمٍ هُوَ فِى شَأْنٍ ﴿٢٩﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٣٠﴾ سَنَفْرُغُ لَكُمْ أَيُّهَ ٱلثَّقَلَانِ ﴿٣١﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٣٢﴾ يَٰمَعْشَرَ ٱلْجِنِّ وَٱلْإِنسِ إِنِ ٱسْتَطَعْتُمْ أَن تَنفُذُوا۟ مِنْ أَقْطَارِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ فَٱنفُذُوا۟ ۚ لَا تَنفُذُونَ إِلَّا بِسُلْطَٰنٍ ﴿٣٣﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٣٤﴾ يُرْسَلُ عَلَيْكُمَا شُوَاظٌ مِّن نَّارٍ وَنُحَاسٌ فَلَا تَنتَصِرَانِ ﴿٣٥﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٣٦﴾ فَإِذَا ٱنشَقَّتِ ٱلسَّمَآءُ فَكَانَتْ وَرْدَةً كَٱلدِّهَانِ ﴿٣٧﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٣٨﴾ فَيَوْمَئِذٍ لَّا يُسْـَٔلُ عَن ذَنۢبِهِۦٓ إِنسٌ وَلَا جَآنٌّ ﴿٣٩﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٤٠﴾

(١٧) خوا خاوەنی هەردوو رۆژهەلاّت و هەردوو رۆژئاوایە.
(١٨) سەرنجی ئایەتی ١٣ بدە.
(١٩) ئاوی دوو دەریای بەرەلاّ کردووە و بەیەک گەیاندووە تێکەڵیش نابن.
(٢٠) چونکە لە نێوانیاندا بەربەستێک هەیە نایەڵێت تێکەڵ ببن (ئەم دیاردەیە لە نێوان دەریای سپی و زەریای ئەتڵەسیداو دەریای سوورو دەریای عەرەبدا ئاشکرایە).
(٢١) سەرنجی ئایەتی ١٣ بدە.
(٢٢) لەو دوو جۆر دەریایە مرواری و مەرجان دەردەچن (کە دوو جۆر گەوهەری بەنرخن).
(٢٣) سەرنجی ئایەتی ١٣ بدە.
(٣٤) هەرچی کەشتی هەیە لە دەریاکاندا وەک بەیداخ، وەک شاخ هاتوچۆ دەکەن، هەر خوایش خاوەنیانە.
(٢٥) سەرنجی ئایەتی ١٣ بدە.
(٢٦) هەموو ئەو کەسانەی لەسەر رووی زەوین، هەر هەمووی فەوتاوو تیاچووە و دەبێت بمرن.
(٢٧) تەنها زاتی پەروەردگاری خاوەن بڵندی و رێزداری تۆیە کە دەمێنێتەوە.
(٢٨) سەرنجی ئایەتی ١٣ بدە.
(٢٩) هەموو گیانلەبەرو زیندەوەران لە ئاسمانەکان و زەویدا بەردەوام بەگوفتارو بەزمانی حاڵ، داوای پێداویستی و داخوازیەکان لە پەروەردگار دەکەن، هەموو رۆژێک و هەموو کاتێک (ملیۆنەهاو ملیارەها، بەڵکو بێ شومار تاوتوێ دەکات لە بوونەوەرو لە جیهانی ئادەمیزادو پەری و فریشتەکان و...هتد). (٣٠) سەرنجی ئایەتی ١٣ بدە.
(٣١) ئەی گرۆی ئادەمیزادو پەری، رۆژێک دێت بە تایبەت لێتان دەپرسینەوە و دادگایتان دەکەین (خوای بالاّدەست هەرەشە لەم دوو دەستەیە لە دروستکراوەکانی دەکات، کە لە هەندێک رووەوە سەرپشکی کردوون و ئازادی داونەتێ، بەلاّم زۆربەیان یاخی و سەرکەشن، قوڕ بەسەر یاخیەکان لەو رۆژەدا).
(٣٢) سەرنجی ئایەتی ١٣ بدە.
(٣٣) ئەی گرۆی پەری و ئادەمیزاد ئەگەر دەتوانن بەبەشەکانی ئاسمانەکان و زەویدا دەرچن، ئەوکارە ئەنجام بدەن، دڵنیاش بن کە ئەوکارە بەهۆی دەزگای ماددی و توانای مەعنەویەوە نەبێت ئەنجام نادرێت.
(٣٤) سەرنجی ئایەتی ١٣ بدە.
(٣٥) خۆ ئەگەر لە سنوور دەرچوون، بڵێسەی ئاگرتان هاوڕێ لەگەڵ مسی تواوەدا بۆ رەوانە دەکرێت، ئیتر شکست دەخۆن و سەرکەوتوو نابن.
(٣٦) سەرنجی ئایەتی ١٣ بدە.
(٣٧) کاتێک دێت ئاسمان لەت دەبێت و وەکو گوڵێکی سوور دێتە بەرچاو، یاخود وەک رۆنی قرچاوی لێ دێت (ئەمەش قۆناغێکە لە قۆناغەکانی تێکچوونی). (٣٨) سەرنجی ئایەتی ١٣ بدە.
(٣٩) ئەو رۆژە هەموو شت روون و ئاشکرایە، پرسیار لە گوناهانی ئادەمیزاد و پەریەکان ناکرێت، (رەنگە ئەوە قۆناغێک بێت لە قۆناغەکان، کە بەروخساریان جیادەکرێنەوە). (٤٠) سەرنجی ئایەتی ١٣ بدە.

يُعۡرَفُ ٱلۡمُجۡرِمُونَ بِسِيمَٰهُمۡ فَيُؤۡخَذُ بِٱلنَّوَٰصِي وَٱلۡأَقۡدَامِ ﴿٤١﴾ فَبِأَيِّ
ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٤٢﴾ هَٰذِهِۦ جَهَنَّمُ ٱلَّتِي يُكَذِّبُ بِهَا ٱلۡمُجۡرِمُونَ
﴿٤٣﴾ يَطُوفُونَ بَيۡنَهَا وَبَيۡنَ حَمِيمٍ ءَانٖ ﴿٤٤﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ
﴿٤٥﴾ وَلِمَنۡ خَافَ مَقَامَ رَبِّهِۦ جَنَّتَانِ ﴿٤٦﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ
﴿٤٧﴾ ذَوَاتَآ أَفۡنَانٖ ﴿٤٨﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٤٩﴾ فِيهِمَا عَيۡنَانِ
تَجۡرِيَانِ ﴿٥٠﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٥١﴾ فِيهِمَا مِن كُلِّ فَٰكِهَةٖ
زَوۡجَانِ ﴿٥٢﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٥٣﴾ مُتَّكِـِٔينَ عَلَىٰ فُرُشِۭ
بَطَآئِنُهَا مِنۡ إِسۡتَبۡرَقٖۚ وَجَنَى ٱلۡجَنَّتَيۡنِ دَانٖ ﴿٥٤﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا
تُكَذِّبَانِ ﴿٥٥﴾ فِيهِنَّ قَٰصِرَٰتُ ٱلطَّرۡفِ لَمۡ يَطۡمِثۡهُنَّ إِنسٞ قَبۡلَهُمۡ
وَلَا جَآنّٞ ﴿٥٦﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٥٧﴾ كَأَنَّهُنَّ ٱلۡيَاقُوتُ
وَٱلۡمَرۡجَانُ ﴿٥٨﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٥٩﴾ هَلۡ جَزَآءُ
ٱلۡإِحۡسَٰنِ إِلَّا ٱلۡإِحۡسَٰنُ ﴿٦٠﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ
﴿٦١﴾ وَمِن دُونِهِمَا جَنَّتَانِ ﴿٦٢﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ
﴿٦٣﴾ مُدۡهَآمَّتَانِ ﴿٦٤﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٦٥﴾ فِيهِمَا
عَيۡنَانِ نَضَّاخَتَانِ ﴿٦٦﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٦٧﴾

(٤١) ئینجا تاوانکارو گوناهباران بە رووخساریاندا دەناسرێنەوە، ئەوسا دەست گیر دەکرێت لە ناوچەوانیان و قاچیان و گلۆلەیان دەکەن و فڕێ دەدرێنە ناو ئاگری دۆزەخەوە.

(٤٢) سەرنجی ئایەتی ١٣ بدە.

(٤٣) دەوترێت: ئەمە ئەو دۆزەخەیە تاوانباران بڕوایان پێی نەبوو.

(٤٤) جا لە نێوان ئاگرو ئاوی گەرمدا کە بە سەروچاویاندا دەکرێت هەر دەخولێنەوە.

(٤٥) سەرنجی ئایەتی ١٣ بدە.

(٤٦) بۆ ئەو کەسەش لە مەقامی پەروەردگاری خۆی ترسابێت، دوو باخی رازاوە ئامادەیە.

(٤٧) سەرنجی ئایەتی ١٣ بدە.

(٤٨) ئەو دوو باخەش خاوەنی دارو درەختی گەڵا ناسک و جوان و بریسکەدارە.

(٤٩) سەرنجی ئایەتی ١٣ بدە.

(٥٠) دوو سەرچاوەی لەکانی و ئاوی سازگاریان تیادایەو بەخوڕ بە جۆگەلەکاندا دەڕۆن.

(٥١) سەرنجی ئایەتی ١٣ بدە.

(٥٢) لەهەموو جۆرە میوەیەک دوو جۆریان تیادایە.

(٥٣) سەرنجی ئایەتی ١٣ بدە.

(٥٤) لەو بەهەشتە خۆشەدا بەختەوەران لەسەر کورسی و قەنەفە و جێگە و ڕێگە خۆشەکان، شانیان داداوە کە لە ئاوریشمی تایبەت ئاواخن کراوە، (داخۆ بەرگەکەی لە چی بێت؟!) لێکردنەوەی هەر میوەیەکیش نزیک و ئاسانە و درەختەکان خۆیان سەر فرو دەهێنن بۆ ئەو بەختەوەرانە.

(٥٥) سەرنجی ئایەتی ١٣ بدە.

(٥٦) لەو بەهەشتەدا حۆری تیادایە کە تەنها تەماشای هاوسەرەکانیان دەکەن، پێش ئەوان دەستی کەسیان لێنەکەوتووە، نە لە گڕۆی ئادەمی و نە لە پەری.

(٥٧) سەرنجی ئایەتی ١٣ بدە.

(٥٨) ئەو هاوسەرانە لە جوانی و شۆخ و شەنگی و قەشەنگیدا وەکو یاقووت و مەرجان وان (کە دوو جۆر گەوهەری بەنرخن، لە دەریا دەردەهێنرێن).

(٥٩) سەرنجی ئایەتی ١٣ بدە.

(٦٠) مەگەر پاداشتی چاکە تەنها چاکە نیە؟!

(٦١) سەرنجی ئایەتی ١٣ بدە.

(٦٢) جگە لەو دوو بەهەشتەی کە باس کرا، دوو بەهەشتی تریش ئامادەیە بۆ ئەوانەی کە پلە و پایەیان وا لەخوار خاوەنانی دوو بەهەشتی ناوبراوەوە.

(٦٣) سەرنجی ئایەتی ١٣ بدە.

(٦٤) (ئەو بەهەشتانەش) ئەوەندە سەوز دەنوێنن مەیلە و ڕەش دەچنەوە لەجوانی و تۆخیدا.

(٦٥) سەرنجی ئایەتی ١٣ بدە.

(٦٦) دوو سەرچاوەی هەڵقوڵاویان تێدایە (کە دیمەنیان زۆر دڵڕفێنە).

(٦٧) سەرنجی ئایەتی ١٣ بدە.

فِيهِمَا فَٰكِهَةٞ وَنَخۡلٞ وَرُمَّانٞ ﴿٦٨﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٦٩﴾ فِيهِنَّ خَيۡرَٰتٌ حِسَانٞ ﴿٧٠﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٧١﴾ حُورٞ مَّقۡصُورَٰتٞ فِي ٱلۡخِيَامِ ﴿٧٢﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٧٣﴾ لَمۡ يَطۡمِثۡهُنَّ إِنسٞ قَبۡلَهُمۡ وَلَا جَآنّٞ ﴿٧٤﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٧٥﴾ مُتَّكِـِٔينَ عَلَىٰ رَفۡرَفٍ خُضۡرٖ وَعَبۡقَرِيٍّ حِسَانٖ ﴿٧٦﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٧٧﴾ تَبَٰرَكَ ٱسۡمُ رَبِّكَ ذِي ٱلۡجَلَٰلِ وَٱلۡإِكۡرَامِ ﴿٧٨﴾




بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ



إِذَا وَقَعَتِ ٱلۡوَاقِعَةُ ﴿١﴾ لَيۡسَ لِوَقۡعَتِهَا كَاذِبَةٌ ﴿٢﴾ خَافِضَةٞ رَّافِعَةٌ ﴿٣﴾ إِذَا رُجَّتِ ٱلۡأَرۡضُ رَجّٗا ﴿٤﴾ وَبُسَّتِ ٱلۡجِبَالُ بَسّٗا ﴿٥﴾ فَكَانَتۡ هَبَآءٗ مُّنۢبَثّٗا ﴿٦﴾ وَكُنتُمۡ أَزۡوَٰجٗا ثَلَٰثَةٗ ﴿٧﴾ فَأَصۡحَٰبُ ٱلۡمَيۡمَنَةِ مَآ أَصۡحَٰبُ ٱلۡمَيۡمَنَةِ ﴿٨﴾ وَأَصۡحَٰبُ ٱلۡمَشۡـَٔمَةِ مَآ أَصۡحَٰبُ ٱلۡمَشۡـَٔمَةِ ﴿٩﴾ وَٱلسَّٰبِقُونَ ٱلسَّٰبِقُونَ ﴿١٠﴾ أُوْلَٰٓئِكَ ٱلۡمُقَرَّبُونَ ﴿١١﴾ فِي جَنَّٰتِ ٱلنَّعِيمِ ﴿١٢﴾ ثُلَّةٞ مِّنَ ٱلۡأَوَّلِينَ ﴿١٣﴾ وَقَلِيلٞ مِّنَ ٱلۡأٓخِرِينَ ﴿١٤﴾ عَلَىٰ سُرُرٖ مَّوۡضُونَةٖ ﴿١٥﴾ مُّتَّكِـِٔينَ عَلَيۡهَا مُتَقَٰبِلِينَ ﴿١٦﴾

(٦٨) درەختی میوەو دارخورماو هەناریان تێدایە.

(٦٩) سەرنجی ئایەتی ١٣ بدە.

(٧٠) لەو بەهەشتانەدا حۆری جوان و شۆخ و شەنگ و رەوشت بەرزی تیادایە.

(٧١) سەرنجی ئایەتی ١٣ بدە.

(٧٢) حۆری چاوگەش و چاورەش، لەو دەوارە تایبەتیانەی کە بۆیان ئامادەکراوە دوور ناکەونەوە.. (ئەڵبەتە هەر ناوی دەوارە، ئەگینا مەگەر هەر خوا خۆی بزانێت چ جێگەورێگەیەکی خۆش و رازاوەیە).

(٧٣) سەرنجی ئایەتی ١٣ بدە.

(٧٤) ئەو حۆریانە، پێش ئەوان دەستی کەسیان لێنەکەوتووە، نە لە گرۆی ئادەمی و نە لە پەری.

(٧٥) سەرنجی ئایەتی ١٣ بدە.

(٧٦) شانیان داداوە لەسەر پشتی سەوزباوی جوان و دۆشەکی نایاب و رازاوە.

(٧٧) سەرنجی ئایەتی ١٣ بدە.

(٧٨) موبارەک و بەرزو بەرێزە ناوی پەروەردگاری تۆ، چونکە ئەو زاتێکە خاوەنی بەرزی و بڵندی و رێزی بێسنوورە بۆ ئیمانداران.

سوورەتی (الواقعة)

بەناوی خوای بەخشندە و میهرەبان

(١) کاتێک رووداوە سامناکەکە پێش دێت.. (مەبەست رۆژی قیامەتە)

(٢) روودانی ئەو کارەساتە حەقیقەتە و کەس ناتوانێت بروای پێی نەبێت و بەراستی نەزانێت.

(٣) نزم کەرەوەیەو بەرزکەرەوە، (ئیمانداران بەرزو پایەدار دەبن، خوانەناسانیش سەرشۆڕ و ریسوا).

(٤) کاتێک زەوی دەشڵەقێت و بەتوندی دەلەرزێت.

(٥) کێوەکانیش وردوخاش دەبن (تەخت و ساف دەبن، بەرزیەکان؛ نشێوەکان پڕ دەکەن).

(٦) دەبنە تەپوتۆزێکی پەرش و بلاو (زەویان پێ تەخت و رێک دەکرێت).

(٧) ئەو کاتە ئێوە دەبنە سێ دەستەوە.

(٨) دەستەی راستان دەردەکەون، جا چووزانی ئەوانە لە چ خۆشیەکدان؟!

(٩) هەروەها دەستەی چەپ و لارو وێرەکانیش، ئای ئەو شوومانە لە چ سەرگەردانیەکدان؟!

(١٠) (دەستەی سێهەم) پێشکەوتووەکانن، ئەوانەن کە پێشکەوتوون لە بەدەستهێنانی رەزامەندی خوادا.

(١١) ئا ئەوانە نزیک کراوەی بارەگای پەروەردگاریانن.

(١٢) لە باخەکانی بەهەشتی پڕ لە نازو نیعمەتدا.

(١٣) دەستەیەکی زۆریان لەوانەن کە زوو چوون بەدەم بانگەوازی خواوە.

(١٤) دەستەیەکی کەمیشیان لەوانەن کە دواتر (بەشوێن ئەواندا رێبازی ئیمانیان گرتەبەر).

(١٥) لەسەر کورسی و قەنەفەی نەخشدارو چنراو بەئاڵتون دانیشتوون.

(١٦) شانیان داداوە لەسەر کورسیەکان بەرامبەر بەیەک، دیارە کە لە بۆنەی تایبەتیدا کە هەمیشە، لە بەهەشتدا بەردەوامە ئیمانداران پێک شاد دەبن.

يَطُوفُ عَلَيْهِمْ وِلْدَانٌ مُّخَلَّدُونَ ﴿١٧﴾ بِأَكْوَابٍ وَأَبَارِيقَ وَكَأْسٍ مِّن مَّعِينٍ ﴿١٨﴾ لَّا يُصَدَّعُونَ عَنْهَا وَلَا يُنزِفُونَ ﴿١٩﴾ وَفَاكِهَةٍ مِّمَّا يَتَخَيَّرُونَ ﴿٢٠﴾ وَلَحْمِ طَيْرٍ مِّمَّا يَشْتَهُونَ ﴿٢١﴾ وَحُورٌ عِينٌ ﴿٢٢﴾ كَأَمْثَالِ اللُّؤْلُؤِ الْمَكْنُونِ ﴿٢٣﴾ جَزَاءً بِمَا كَانُوا يَعْمَلُونَ ﴿٢٤﴾ لَا يَسْمَعُونَ فِيهَا لَغْوًا وَلَا تَأْثِيمًا ﴿٢٥﴾ إِلَّا قِيلًا سَلَامًا سَلَامًا ﴿٢٦﴾ وَأَصْحَابُ الْيَمِينِ مَا أَصْحَابُ الْيَمِينِ ﴿٢٧﴾ فِي سِدْرٍ مَّخْضُودٍ ﴿٢٨﴾ وَطَلْحٍ مَّنضُودٍ ﴿٢٩﴾ وَظِلٍّ مَّمْدُودٍ ﴿٣٠﴾ وَمَاءٍ مَّسْكُوبٍ ﴿٣١﴾ وَفَاكِهَةٍ كَثِيرَةٍ ﴿٣٢﴾ لَّا مَقْطُوعَةٍ وَلَا مَمْنُوعَةٍ ﴿٣٣﴾ وَفُرُشٍ مَّرْفُوعَةٍ ﴿٣٤﴾ إِنَّا أَنشَأْنَاهُنَّ إِنشَاءً ﴿٣٥﴾ فَجَعَلْنَاهُنَّ أَبْكَارًا ﴿٣٦﴾ عُرُبًا أَتْرَابًا ﴿٣٧﴾ لِّأَصْحَابِ الْيَمِينِ ﴿٣٨﴾ ثُلَّةٌ مِّنَ الْأَوَّلِينَ ﴿٣٩﴾ وَثُلَّةٌ مِّنَ الْآخِرِينَ ﴿٤٠﴾ وَأَصْحَابُ الشِّمَالِ مَا أَصْحَابُ الشِّمَالِ ﴿٤١﴾ فِي سَمُومٍ وَحَمِيمٍ ﴿٤٢﴾ وَظِلٍّ مِّن يَحْمُومٍ ﴿٤٣﴾ لَّا بَارِدٍ وَلَا كَرِيمٍ ﴿٤٤﴾ إِنَّهُمْ كَانُوا قَبْلَ ذَٰلِكَ مُتْرَفِينَ ﴿٤٥﴾ وَكَانُوا يُصِرُّونَ عَلَى الْحِنثِ الْعَظِيمِ ﴿٤٦﴾ وَكَانُوا يَقُولُونَ أَئِذَا مِتْنَا وَكُنَّا تُرَابًا وَعِظَامًا أَإِنَّا لَمَبْعُوثُونَ ﴿٤٧﴾ أَوَآبَاؤُنَا الْأَوَّلُونَ ﴿٤٨﴾ قُلْ إِنَّ الْأَوَّلِينَ وَالْآخِرِينَ ﴿٤٩﴾ لَمَجْمُوعُونَ إِلَىٰ مِيقَاتِ يَوْمٍ مَّعْلُومٍ ﴿٥٠﴾

لاوانی جوان و نیسک سووک و نەمر بە دەوریاندا دێن وخزمەتیان دەکەن و هەمیشە گەنجن و پیرنابن.

بەکوپ و دۆلکە و سوراحیەوە دەگەڕێن و لەپەرداخی تایبەتدا جۆرەها شەربەت و شەراب و خواردنەوەی بەتام و خۆشیان پێشکەش دەکەن کە لەسەرچاوەیەکی رەوانەوە پڕ دەکرێن.

ئەو شەرابانە نە سەریان پێی دێتە ئێش و نە سەرخۆش دەبن.

میوەشیان بۆ دەگێڕن، بە ئارەزووی خۆیان لێی هەڵدەبژێرن.

گۆشتی هەر باڵندەیەکیش کە حەزی لێ بکەن بۆیان ئامادەیە.

هاوڕێ لەگەڵ حۆری چاوگەش و چاو ڕەشیش...

وەک مرواری شاراوە ودەست لێ نەکەتوو.

لە پاداشتی کاروکردەوەی چاکیانداکە دەیانکرد . . .

هیچ جۆرە قسەیەکی نابەجێ ونادروست و نارێک نابیستن و یەکتریش گوناهبار ناکەن.

جگە لە وتنی سلاو و وەلامدانەوە و قسەی خۆش نەبێت.

دەستەی راستەکانیش، جا چووزانی کە ئەوانیش لە چ خۆشیەکدان.

لە ژێر سێبەری ـ سدر ـ ی بێ دڕکدان.

هەروەها درەختی مۆزیش کە بەرهەمەکانی چین چین لەسەر یەکن.

لە ژێر سێبەری دوورو درێژدان لەو باخە خۆشانەدا.

تاڤگەی جوان و حەوز و فوارەی رازاوەی تێدایە.

میوەهاتی زۆرو هەمە چەشنیش.

نە بەروبومی تەواودەبێت، نە قەدەغە کراویشە.

هەروەها راخەری بەرزو بڵندی لێیە.

ئەو حۆریانەمان بەتایبەت بۆ دروست کردوون . . .

کردوومانن بەحۆریانی هەمیشە کیژ.

هاوسەرەکانیان زۆرخۆش دەوێت و هەموویان هاو تەمەنن.

ئەمانە هەمووی بۆ دەستەی راستەکان (ئەوانەی نامەی کردەوەکانیان درایە دەستی راستیان).

ئەوانە دەستەیەکی زۆریان لە ئیماندارانی پێشینن.

هەروەها دەستەیەکی زۆریش لە ئیماندارانی دوایین دەگرێتەوە.

لەولاشەوە دەستەی چەپەکان، قوڕبەسەریان، بۆ بارو دۆخێک کە تێی کەوتوون.

لەناو گڕە و ئاوی لەکوڵ دا گیریان خواردووە و دەتلێنەوە.

رادەکەن بۆ ژێر سێبەر، کە ئەویش دووکەڵی ڕەش و گەرم و سوتێنەرە.

نە فێنکە و نە بەکەڵکی حەوانەوە دێت.

چونکە بەراستی ئەوانە کاتی خۆی لەناو نازو نیعمەتی حەرامدا دەتلانەوە.

ئەوانە بەردەوام لەسەر گوناهە گەورەکە پێیان دادەگرت (هاوەڵیان بۆ خوا بریار دەدا).

هەمیشە دەیانوت: ئایا کاتێک ئێمە مردین و بووینە خاک و ئێسقان ئێمە زیندوودەکرێینەوە؟!

یاخود باوو باپیرانی دێرینیشمان؟!

ئەی پێغەمبەر ، پێیان بڵێ: بێگومان پێشینان و پاشینان هەرهەموویان.

کۆ دەکرێنەوە و راپێچ دەکرێن بەرەو مەیدانی رۆژی دیاری کراو.

ثُمَّ إِنَّكُمْ أَيُّهَا ٱلضَّآلُّونَ ٱلْمُكَذِّبُونَ ﴿٥١﴾ لَءَاكِلُونَ مِن شَجَرٍ مِّن زَقُّومٍ ﴿٥٢﴾ فَمَالِـُٔونَ مِنْهَا ٱلْبُطُونَ ﴿٥٣﴾ فَشَٰرِبُونَ عَلَيْهِ مِنَ ٱلْحَمِيمِ ﴿٥٤﴾ فَشَٰرِبُونَ شُرْبَ ٱلْهِيمِ ﴿٥٥﴾ هَٰذَا نُزُلُهُمْ يَوْمَ ٱلدِّينِ ﴿٥٦﴾ نَحْنُ خَلَقْنَٰكُمْ فَلَوْلَا تُصَدِّقُونَ ﴿٥٧﴾ أَفَرَءَيْتُم مَّا تُمْنُونَ ﴿٥٨﴾ ءَأَنتُمْ تَخْلُقُونَهُۥٓ أَمْ نَحْنُ ٱلْخَٰلِقُونَ ﴿٥٩﴾ نَحْنُ قَدَّرْنَا بَيْنَكُمُ ٱلْمَوْتَ وَمَا نَحْنُ بِمَسْبُوقِينَ ﴿٦٠﴾ عَلَىٰٓ أَن نُّبَدِّلَ أَمْثَٰلَكُمْ وَنُنشِئَكُمْ فِى مَا لَا تَعْلَمُونَ ﴿٦١﴾ وَلَقَدْ عَلِمْتُمُ ٱلنَّشْأَةَ ٱلْأُولَىٰ فَلَوْلَا تَذَكَّرُونَ ﴿٦٢﴾ أَفَرَءَيْتُم مَّا تَحْرُثُونَ ﴿٦٣﴾ ءَأَنتُمْ تَزْرَعُونَهُۥٓ أَمْ نَحْنُ ٱلزَّٰرِعُونَ ﴿٦٤﴾ لَوْ نَشَآءُ لَجَعَلْنَٰهُ حُطَٰمًا فَظَلْتُمْ تَفَكَّهُونَ ﴿٦٥﴾ إِنَّا لَمُغْرَمُونَ ﴿٦٦﴾ بَلْ نَحْنُ مَحْرُومُونَ ﴿٦٧﴾ أَفَرَءَيْتُمُ ٱلْمَآءَ ٱلَّذِى تَشْرَبُونَ ﴿٦٨﴾ ءَأَنتُمْ أَنزَلْتُمُوهُ مِنَ ٱلْمُزْنِ أَمْ نَحْنُ ٱلْمُنزِلُونَ ﴿٦٩﴾ لَوْ نَشَآءُ جَعَلْنَٰهُ أُجَاجًا فَلَوْلَا تَشْكُرُونَ ﴿٧٠﴾ أَفَرَءَيْتُمُ ٱلنَّارَ ٱلَّتِى تُورُونَ ﴿٧١﴾ ءَأَنتُمْ أَنشَأْتُمْ شَجَرَتَهَآ أَمْ نَحْنُ ٱلْمُنشِـُٔونَ ﴿٧٢﴾ نَحْنُ جَعَلْنَٰهَا تَذْكِرَةً وَمَتَٰعًا لِّلْمُقْوِينَ ﴿٧٣﴾ فَسَبِّحْ بِٱسْمِ رَبِّكَ ٱلْعَظِيمِ ﴿٧٤﴾ ۞ فَلَآ أُقْسِمُ بِمَوَٰقِعِ ٱلنُّجُومِ ﴿٧٥﴾ وَإِنَّهُۥ لَقَسَمٌ لَّوْ تَعْلَمُونَ عَظِيمٌ ﴿٧٦﴾



پاشان بێگومان ئێوه ئەی گومڕاو بێباوەڕان ئەی ئەوانەی کە بڕواتان بە ڕاستیەکان نیە.
لە بەروبوومی درەختی ژەقنەبوتیش دەخۆن.
ورگ و سکتانی لێ پڕ دەکەن.
ئینجا ئاوی لەکوڵیشی بەسەردا دەکەن.
هەر وەکو ئەو حوشترانەی بەهۆی نەخۆشیەکی تایبەتیەوە تێر ئاو نابن.
ئەمە میوانداری ئەوانە لە قیامەتدا.
ئێمە دروستمان کردوون دە بۆچی بڕوا ناکەن؟!
جا پێم بڵێن ئەو مەنیەیەی کە لە جێی خۆیدا دایدەنێن؟ (چیە و چۆنە؟ لەم سەردەمەدا زانستی هەندێک نهێنیەکانی ڕوون کردۆتەوە، کە چۆن لە نێوان ملیۆنەهادا بەویستی خوا یەک دانەی یەک دەگرێت لەگەڵ هێلکۆکەیەکدا لە سەرەتای دروستبوونی ئادەمیزادا).
ئایا ئێوە دروستی دەکەن یان ئێمە بەدیهێنەرین؟!
ئێمە نەخشەی مردنمان لە نێوانتاندا بڕیار داوە، کەس دەسەڵاتی پێش ئێمە نەکەوتووە و بێ تواناش نین...
کە لە شوێنی ئێوە ئەوەی تر بهێنین و بیخەینە شوێنتان، یاخود سەرلەنوێ لە ڕێگەیەکەوە کە نایزانن دروستتان بکەینەوە.
سوێند بە خوا خۆ ئەوەتە بوونی سەرەتاو یەکەم جارتان زانیووەو بەچاوی خۆتان بینیوتانە چۆن پەیدادەبن، کەواتە بۆچی یاداوەری وەرناگرن و بیر ناکەنەوە؟!
ئایا سەرنجتانداوە لەو زەویەی کە دەیکێڵن و دەیچێنن؟
ئایا ئێوە دەیروێنن، یان هەر ئێمەین ڕوێنەر و بەرهەم هێنەر.
ئینجا ئەگەر بمانویستایە دەمانکردە چیلکە و چەواڵی بێخێر، ئەوسا دەستتان دەکرد بەقسەی بێ هودە.
بەخەفەت و پەژارەوە دەڵێن: بەڕاستی زەرەری چاکمان کرد، ڕەنجەڕۆ خۆمان.
بەڵکو بێ بەریی و بێ بەهرە خۆمان.
ئەی سەرنجی ئەو ئاوە نادەن کە ڕۆژانە چەند جار دەیخۆنەوە (لەکوێوە هات، کێ دروستیکرد، لەچی دروست بوو)
ئایا ئێوە داتانبەزاندووە لە هەورەکانەوە یان ئێمە دابەزێنەرین؟ (بەهۆی یاسای تایبەتەوە).
ئەگەر بمانویستایە ئەو ئاوەمان دەکردە خوێیەکی تاڵ و سوێر، جا ئایا بۆ سوپاسگوزاری ناکەن.
ئایا سەرنجی ئەو ئاگرە نادەن کە دایدەگیرسێنن (لە جۆرەها سەرچاوەوە.. چیە؟ چۆنە؟).
ئایا ئێوە دارەکەیتان دروست کردووە یان ئێمە بەدیهێنەرین؟ (ئەمەش ئاماژەیە کە نەوت لە دەرئەنجامی ژێرەو ژوور بوونی دارستانەکان بەدیهاتوون).
هەر ئێمە کردوومانەتە هۆی ئەوەی کە یادخەرەوە بێت، هەروەها کردوومانەتە هۆیەک بۆ ئەوەی گەڕۆک و گەشتیاران و دەسەڵاتداران کەڵکی لێ وەربگرن.
جا کەواتە ستایش و سوپاسگوزاری پەروەردگاری گەورەبە و با ناوی پیرۆزی هەمیشە لەسەر زارت بێت.
سوێندم بە شوێنی ئەستێرەکان (لە ئاسمانی فراواندا کە لە ژمارە نایەن).
بێگومان ئەو سوێندە گەر بزانن سوێندێکی زۆر گەورەیە (لەم سەردەمەدا زیاتر ڕوون بۆتەوە کەخوای بەدیهێنەر ملیۆنەها کاکێشان و ملیارەها ئەستێرەی دروستکردووە، کە کۆمەڵەی خۆر لە ئاستیدا زۆر بچووکن).

إِنَّهُۥ لَقُرْءَانٌ كَرِيمٌ ﴿٧٧﴾ فِى كِتَٰبٍ مَّكْنُونٍ ﴿٧٨﴾ لَّا يَمَسُّهُۥٓ إِلَّا ٱلْمُطَهَّرُونَ ﴿٧٩﴾ تَنزِيلٌ مِّن رَّبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٨٠﴾ أَفَبِهَٰذَا ٱلْحَدِيثِ أَنتُم مُّدْهِنُونَ ﴿٨١﴾ وَتَجْعَلُونَ رِزْقَكُمْ أَنَّكُمْ تُكَذِّبُونَ ﴿٨٢﴾ فَلَوْلَآ إِذَا بَلَغَتِ ٱلْحُلْقُومَ ﴿٨٣﴾ وَأَنتُمْ حِينَئِذٍ تَنظُرُونَ ﴿٨٤﴾ وَنَحْنُ أَقْرَبُ إِلَيْهِ مِنكُمْ وَلَٰكِن لَّا تُبْصِرُونَ ﴿٨٥﴾ فَلَوْلَآ إِن كُنتُمْ غَيْرَ مَدِينِينَ ﴿٨٦﴾ تَرْجِعُونَهَآ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ ﴿٨٧﴾ فَأَمَّآ إِن كَانَ مِنَ ٱلْمُقَرَّبِينَ ﴿٨٨﴾ فَرَوْحٌ وَرَيْحَانٌ وَجَنَّتُ نَعِيمٍ ﴿٨٩﴾ وَأَمَّآ إِن كَانَ مِنْ أَصْحَٰبِ ٱلْيَمِينِ ﴿٩٠﴾ فَسَلَٰمٌ لَّكَ مِنْ أَصْحَٰبِ ٱلْيَمِينِ ﴿٩١﴾ وَأَمَّآ إِن كَانَ مِنَ ٱلْمُكَذِّبِينَ ٱلضَّآلِّينَ ﴿٩٢﴾ فَنُزُلٌ مِّنْ حَمِيمٍ ﴿٩٣﴾ وَتَصْلِيَةُ جَحِيمٍ ﴿٩٤﴾ إِنَّ هَٰذَا لَهُوَ حَقُّ ٱلْيَقِينِ ﴿٩٥﴾ فَسَبِّحْ بِٱسْمِ رَبِّكَ ٱلْعَظِيمِ ﴿٩٦﴾



بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

سَبَّحَ لِلَّهِ مَا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ ﴿١﴾ لَهُۥ مُلْكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ يُحْىِۦ وَيُمِيتُ وَهُوَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ ﴿٢﴾ هُوَ ٱلْأَوَّلُ وَٱلْءَاخِرُ وَٱلظَّٰهِرُ وَٱلْبَاطِنُ وَهُوَ بِكُلِّ شَىْءٍ عَلِيمٌ ﴿٣﴾

بەڕاستی ئەوەی کە محمد ﷺ دەیخوێنێتەوە قورئانێکە زۆر پیرۆزو بەڕێزە.

لە کتێبێکی شاراوەدا کە ـ لـوح المحفوظ ـە، پـارێزراوە، (هـەروەها نـسـخەکانی سـەر زەویشـی پارێزراوە و پارێزراو دەبێت هەتا دنیا دنیایە).

تەنها پاکان نەبێت کەس دەستی لێ نادات .

ئەم قورئانە لەلایەن پەروەردگاری جیهانیانەوە نێردراوەتە خوارەوە.

لەگەڵ ئەو هەموو رێزەدا کە دەربارەی قورئان وترا، هێشتا ئێوە ئەی باوەڕ لاوازان دوودڵن بەرامبەر ئەم گوفتار و فەرموودەیە و کەمتەرخەمن لـە بـەجێ هێنانی فەرمانەکانیدا؟

هەموو بەهرەیەک کە دەبوایە لە قورئان وەری بگرن بۆتـە ئـەوەی کـە بـڕوای پـێ ناکـەن و بـەدرۆی دەزانن؟

باشە؛ ئێوە بۆ بیرناکەنەوە، رۆژێک دێـت کـە: رۆحتان دەگاتە گەرووتان.

ئێوەش بە دەوری ئەو کەسەدا بێ دەسـەڵاتانە تەماشا دەکەن و سەرنج دەدەن.

لەکاتێکدا کە ئێمە لـە ئێـوە نزیکترین لێـی، بەڵام ئێوە نامانبینن.

خۆ ئەگەر ئێوە زینـدوو ناکرێنـەوە و پاداشـت نادرێنەوە...

ئەو رۆحەتان دەگێڕایەوە ئەگەر راست دەکەن و دەسەڵاتتان هەیە.

جا ئەگەر ئەو کەسەی کە لە سەرەمەرگدایە لە نزیکان و خۆشەویستانی ئێمە بێت.

ئەوە ئیـتر خۆشـی و کامـەرانی و ئاسـوودەیی بەهەشتی پڕ لە نازو نیعمەت چاوەڕێیەتی.

خۆ ئەگەر لە دەستەی راستانیش بێت.

ئەوە لەلایەن دەستەی راستانەوە سڵاوت پێشکەش دەکرێت.

بەڵام ئەگەر لە دەستەی ئەوانە بێت کە گومڕان و بڕوایان بە بەرنامەی خوا نیە...

بە ئاوی لە کوڵ پێشوازیی لێ دەکرێت...

دەگەیەنرێتە دۆزەخ.

بەڕاستی ئەوەی کە باسمان کرد حەقیقەت و راستەقینەیە و دوور لە گومانە.

کەواتە ستایش و سوپاسگوزاری پەروەردگاری گەورە بکە (با ناوی پیرۆزی هەمیشە لەسەر زارت بێت).

سورەتی (الحـدیـد)

بەناوی خوای بەخشندە و میهرەبان

هەرچی لە ئاسمانەکان و زەویدا هەیە تەسبیحات و ستایشی خوا دەکات، ئەویش زاتێکی باڵادەست و دانایە.

هەرچی لـە ئـاسمانـەکان و زەویدا هەیە هـەر ئـەو خـاوەنـیانـە، دەژێنـێ و دەمرێنـێ، هـەر خـۆی دەسـەڵاتی بەسـەر هەموو شتێکدا هەیە.

ئەو خوایە یەکەمینە و لە سەرەتاوە هەر هەبووە و کەس پێش ئەو نەبووە، دواهەمینە وکۆتایە، کەس دوای ئـەو نـامێنێت، (بەڵام ئەو هەر دەمێنێت)، هەروەها ئەو زاتە دیارە و هەموو شت بەڵگەیە لەسەر بوونی، لە هەمان کاتدا زاتی خـۆی نادیـارە و (بەچاوی سەر نابینرێت، بەڵام بەبینایی بیروهۆش و دڵ و دەروون ئاشکرایە)، هەر خۆیشی زانایە بەهەموو شتێک.

هُوَ ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ فِى سِتَّةِ أَيَّامٍ ثُمَّ ٱسْتَوَىٰ عَلَى ٱلْعَرْشِ ۚ يَعْلَمُ مَا يَلِجُ فِى ٱلْأَرْضِ وَمَا يَخْرُجُ مِنْهَا وَمَا يَنزِلُ مِنَ ٱلسَّمَآءِ وَمَا يَعْرُجُ فِيهَا ۖ وَهُوَ مَعَكُمْ أَيْنَ مَا كُنتُمْ ۚ وَٱللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ ﴿٤﴾ لَّهُۥ مُلْكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۚ وَإِلَى ٱللَّهِ تُرْجَعُ ٱلْأُمُورُ ﴿٥﴾ يُولِجُ ٱلَّيْلَ فِى ٱلنَّهَارِ وَيُولِجُ ٱلنَّهَارَ فِى ٱلَّيْلِ ۚ وَهُوَ عَلِيمٌۢ بِذَاتِ ٱلصُّدُورِ ﴿٦﴾ ءَامِنُوا۟ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ وَأَنفِقُوا۟ مِمَّا جَعَلَكُم مُّسْتَخْلَفِينَ فِيهِ ۖ فَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ مِنكُمْ وَأَنفَقُوا۟ لَهُمْ أَجْرٌ كَبِيرٌ ﴿٧﴾ وَمَا لَكُمْ لَا تُؤْمِنُونَ بِٱللَّهِ ۙ وَٱلرَّسُولُ يَدْعُوكُمْ لِتُؤْمِنُوا۟ بِرَبِّكُمْ وَقَدْ أَخَذَ مِيثَٰقَكُمْ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ ﴿٨﴾ هُوَ ٱلَّذِى يُنَزِّلُ عَلَىٰ عَبْدِهِۦٓ ءَايَٰتٍۭ بَيِّنَٰتٍ لِّيُخْرِجَكُم مِّنَ ٱلظُّلُمَٰتِ إِلَى ٱلنُّورِ ۚ وَإِنَّ ٱللَّهَ بِكُمْ لَرَءُوفٌ رَّحِيمٌ ﴿٩﴾ وَمَا لَكُمْ أَلَّا تُنفِقُوا۟ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ وَلِلَّهِ مِيرَٰثُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۚ لَا يَسْتَوِى مِنكُم مَّنْ أَنفَقَ مِن قَبْلِ ٱلْفَتْحِ وَقَٰتَلَ ۚ أُو۟لَٰٓئِكَ أَعْظَمُ دَرَجَةً مِّنَ ٱلَّذِينَ أَنفَقُوا۟ مِنۢ بَعْدُ وَقَٰتَلُوا۟ ۚ وَكُلًّا وَعَدَ ٱللَّهُ ٱلْحُسْنَىٰ ۚ وَٱللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرٌ ﴿١٠﴾ مَّن ذَا ٱلَّذِى يُقْرِضُ ٱللَّهَ قَرْضًا حَسَنًا فَيُضَٰعِفَهُۥ لَهُۥ وَلَهُۥٓ أَجْرٌ كَرِيمٌ ﴿١١﴾

هەر ئەو زاتە خۆی، ئاسمانەکان و زەوی لە شەش رۆژدا دروست کردووە، لەوەودوا لەسەر تەختی فەرمانڕەوایی خۆی پایەدارکرد (سەرنجی الرعد/٢ بدە)، هەر خۆی دەزانێت چی دەچێت بە ناخی زەویدا و چیشی لیٚ دێتە دەرەوە، چی لە ئاسمان دێتە خوارەوە و چی پیادا سەردەکەوێت، جا لەهەر شوێنێک دابن ئەوزاتە لەگەڵتاندایە و پێتان دەزانێت، دڵنیابن کە خوا بە هەموو ئەو کارو کردەوانەی ئەنجامی دەدەن بینایە.

هەرچی لە ئاسمانەکان و زەویدا هەیە ئەو زاتە خاوەنیانە، هەموو شتێکیش بۆ لای خوا دەبرێتەوە.

شەو تێهەڵکێشی رۆژ دەکات و رۆژ تێهەڵکێشی شەو دەکات (بە درێژ بوونی لایەکیان لەسەر حسابی ئەوی تریان، یان لە بەرەبەیان و ئێوارانـدا تێهەڵکێش دەبن)، ئەو زاتە زانایە بەهەرچی لە دڵ و دەروون و سینەکاندایە.

خەڵکینە ئیمان و باوەڕی دامەرزاو بهێنن بە خواو پێغەمبەرەکەی، لەو ماڵ و سامانەی کە خستویەتیە ژێر دەستان و جێنشینن تیایدا، ببەخشن، بێگومان ئەوانەی کە باوەڕیان هێناوە لە ئێوە و ماڵ و سامان دەبەخشن پاداشتی گەورە چاوەڕێیانە.

جا ئەوە چیتانە و بۆچی باوەڕ ناهێنن بە خوا لە کاتێکدا پێغەمبەر بانگتان دەکات: کە باوەڕ بهێنن بەپەروەردگارتان، خۆ ئەو بێگومان پەیمانیشی لیٚ وەرگرتن، ئەگەر ئێوە ئیماندارن.

خوا ئەو زاتەیە ئایەتە روون و ئاشکراکانی قورئان دادەبەزێنێت بۆ سەر بەندەی خۆی، تا لە تاریکاییەکان دەرتان بهێنێت و بتانخاتە ناو نوور و روناکیەوە، بەڕاستی ئەو خوایە بەسۆزو میهرەبانە بۆتان.

جا ئیتر ئەوە چیتانەو بۆچی ماڵ و سامانتان نابەخشن لە ڕێگەی خوادا، خۆ هەرچی لە ئاسمانەکان و زەویدا هەیە بۆ خوا دەمێنێتەوە، بێگومان چوونیەک نین ئەوانەتان کە پێش رزگاریی مەککە؛ یاخود پێش سەرکەوتن، ماڵ و سامانی بەخشیوەو جەنگاوە، چونکە ئەوانە پلەو پایەیان زۆر بەرزترە لەوانەی کە دوای رزگاریی مەککە و بەدەست هێنانی سەرکەوتن ماڵ و سامانیان بەخشیوە و جەنگاون، بە هەردوولاشیان خوا بەڵێنی بەهەشتی بەخشیوە، بێگومان ئەو خوایە ئاگایە بەکاروکردەوەتان.

ئایا کێیە ئەوەی قەرزی چاک دەدات بەخواو ماڵ و سامانی دەبەخشێت لە پێناوی بەدەستهێنانی ڕەزامەندی خوادا، ئینجا خوایش پاداشتی بێ سنووری دەداتێ و بۆی چەند بەرابەر دەکات، هەروەها پاداشتی بەرێزو بە نرخی بۆ ئامادە کردووە.

يَوۡمَ تَرَى ٱلۡمُؤۡمِنِينَ وَٱلۡمُؤۡمِنَٰتِ يَسۡعَىٰ نُورُهُم بَيۡنَ أَيۡدِيهِمۡ وَبِأَيۡمَٰنِهِم بُشۡرَىٰكُمُ ٱلۡيَوۡمَ جَنَّٰتٞ تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَاۚ ذَٰلِكَ هُوَ ٱلۡفَوۡزُ ٱلۡعَظِيمُ ﴿١٢﴾ يَوۡمَ يَقُولُ ٱلۡمُنَٰفِقُونَ وَٱلۡمُنَٰفِقَٰتُ لِلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱنظُرُونَا نَقۡتَبِسۡ مِن نُّورِكُمۡ قِيلَ ٱرۡجِعُواْ وَرَآءَكُمۡ فَٱلۡتَمِسُواْ نُورٗا فَضُرِبَ بَيۡنَهُم بِسُورٖ لَّهُۥ بَابُۢ بَاطِنُهُۥ فِيهِ ٱلرَّحۡمَةُ وَظَٰهِرُهُۥ مِن قِبَلِهِ ٱلۡعَذَابُ ﴿١٣﴾ يُنَادُونَهُمۡ أَلَمۡ نَكُن مَّعَكُمۡۖ قَالُواْ بَلَىٰ وَلَٰكِنَّكُمۡ فَتَنتُمۡ أَنفُسَكُمۡ وَتَرَبَّصۡتُمۡ وَٱرۡتَبۡتُمۡ وَغَرَّتۡكُمُ ٱلۡأَمَانِيُّ حَتَّىٰ جَآءَ أَمۡرُ ٱللَّهِ وَغَرَّكُم بِٱللَّهِ ٱلۡغَرُورُ ﴿١٤﴾ فَٱلۡيَوۡمَ لَا يُؤۡخَذُ مِنكُمۡ فِدۡيَةٞ وَلَا مِنَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْۚ مَأۡوَىٰكُمُ ٱلنَّارُۖ هِيَ مَوۡلَىٰكُمۡۖ وَبِئۡسَ ٱلۡمَصِيرُ ﴿١٥﴾ ۞ أَلَمۡ يَأۡنِ لِلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَن تَخۡشَعَ قُلُوبُهُمۡ لِذِكۡرِ ٱللَّهِ وَمَا نَزَلَ مِنَ ٱلۡحَقِّ وَلَا يَكُونُواْ كَٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡكِتَٰبَ مِن قَبۡلُ فَطَالَ عَلَيۡهِمُ ٱلۡأَمَدُ فَقَسَتۡ قُلُوبُهُمۡۖ وَكَثِيرٞ مِّنۡهُمۡ فَٰسِقُونَ ﴿١٦﴾ ٱعۡلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ يُحۡيِ ٱلۡأَرۡضَ بَعۡدَ مَوۡتِهَاۚ قَدۡ بَيَّنَّا لَكُمُ ٱلۡأٓيَٰتِ لَعَلَّكُمۡ تَعۡقِلُونَ ﴿١٧﴾ إِنَّ ٱلۡمُصَّدِّقِينَ وَٱلۡمُصَّدِّقَٰتِ وَأَقۡرَضُواْ ٱللَّهَ قَرۡضًا حَسَنٗا يُضَٰعَفُ لَهُمۡ وَلَهُمۡ أَجۡرٞ كَرِيمٞ ﴿١٨﴾



(١٢) رۆژێک دێت کە دەبینیت پیاوانی ئیماندارو ژنانی ئیماندار بەرەو بەهەشت بەڕێ دەکرێن، نوورو روناکیەکی ئاشکرا لەبەردەم و لەلای راستیانەوە دەڕوا، فریشتەکان پێیان دەڵێن: مژدەی ئێوە ئەمڕۆ باخەکانی بەهەشتە کە چەندەها روبار بەناویاندا دەڕوات؛ هاوڕێ لەگەڵ ژیانی هەمیشەیی و نەبڕاوە تیایدا، ئا ئەوەیە سەرکەوتن و سەرفرازی گەورە و بێ‌سنوور.

(١٣) (ئا لەو رۆژەدا کە ئیمانداران بەرەو بەهەشت بە رێ دەکرێن) پیاوان و ژنانی دووڕوو دەهێنرێنە سەر رێیان، بەغەمبارییەوە بۆ ئیمانداران دەڕوانن، ئیماندارانیش هیچ لایان لێ ناکەنەوە، بۆیە بە غەمو پەژارەیەکی زۆرەوە پێیان دەڵێن: دە تەماشایەکمان بکەن با لە نووری رووخسارتان بەهرەوەر ببین، بەڵام پێیان دەوترێت بگەڕێنەوە دواوە ؛ خۆتان بەشوێن نوورو روناکیدا بگەڕێن، دەستبەجێ دیوارێک دروست دەکرێت لە نێوان ئیمانداران و دووڕووەکاندا دەروازەیەکیشی تێدایە، دیوی ناوەوە کە رووی لە ئیماندارانە رووی لە رەحمەت و بەهەشتە و دیوی دەرەوە، کە رووی لە دووڕووەکانە رووی لە سزاو دۆزەخە.

(١٤) ئینجا دووڕووەکان هاوار لە ئیمانداران دەکەن، ئایا ئێمە هاوڕێی ئێوە نەبووین؟!، ئێمە هاوکاری ئێوە نەبووین؟! ئیمانداران دەڵێن: بەڵێ وایە، بەڵام ئێوە خۆتان تووشی دووڕوویی و پیلانگێڕیی کرد، خۆتان مەڵاس دابوو، بۆ فرسەت دەگەڕان کە زەرەر بدەن لە ئیمانداران، هەمیشە لە گومان و دوودڵیدا دەژیان و بلاویشتان دەکردەوە، هیواو ئاواتی بێ‌جێ سەری لێ تێک دابوون، هەتا ویستی خوا یەخەی پێگرتن و کۆتایی بە ژیانتان هات، شەیتانیش غەڕاو گومڕای کردبوون بە میهرەبانی خوا و لە رێبازەکەی وێڵی کردبوون.

(١٥) ئەمڕۆ ئیتر هیچ جۆرە پاکانە و بارمتەیەک لە ئێوە و لەوانەش کە بێ باوەڕ بوون وەرناگیرێت، شوێنەوار و مەنزڵگای هەمووتان ئاگری دۆزەخە، هەر ئەوەش شایستەتانە، ئای چ سەرەنجامێکی خراپ و نالەبارە.

(١٦) ئایا ئیتر کاتی ئەوە نەهاتووە بۆ ئەوانەی کە باوەڕیان هێناوە، دڵەکانیان بە نوری ئیمان ملکەچ وروناک بۆتەوە، ترسی خوای تێدا بڕوێنن بەهۆی یادی بەردەوامی خواو ئەو قورئانەی کە رەوانە کراوە، وەک ئەو کەسانە نەبن کە کتێبی ئاسمانییان بۆ رەوانەکرا، بەڵام دوای تێپەڕ بوونی ماوەیەکی دوورو درێژ، دڵیان رەق و رەش بوو، زۆربەشیان یاخی و سەرکەش و نالەبار دەرچوون.

(١٧) بەڕاستی چاک بزانن کە هەر خوا زەوی زیندوو دەکاتەوە دوای مردنی (ئێوەش ئاوا زیندوو دەکاتەوە)، بێگومان بەڵگەو نیشانەی دەسەڵاتداری خۆمانمان بۆ روون کردنەوە، بۆ ئەوەی ژیربن و بفامن.

(١٨) بەڕاستی ئەوانەی کە خێرخوازن لە پیاوان و لە ئافرەتان، ئەوانەی کە قەرز دەدەن بە خواو ماڵ و سامانیان لە پێناوی رەزامەندی ئەودا دەبەخشن، ئەوانە چەند بەرابەر پاداشتیان دەدرێتەوە و پاداشتی بەڕێزو بەنرخ چاوەڕێیانە.

وَالَّذِينَ ءَامَنُوا بِاللَّهِ وَرُسُلِهِۦٓ أُولَٰٓئِكَ هُمُ الصِّدِّيقُونَ وَالشُّهَدَآءُ عِندَ رَبِّهِمْ لَهُمْ أَجْرُهُمْ وَنُورُهُمْ وَالَّذِينَ كَفَرُوا وَكَذَّبُوا بِـَٔايَٰتِنَآ أُولَٰٓئِكَ أَصْحَٰبُ الْجَحِيمِ ﴿١٩﴾ اعْلَمُوٓا أَنَّمَا الْحَيَوٰةُ الدُّنْيَا لَعِبٌ وَلَهْوٌ وَزِينَةٌ وَتَفَاخُرٌۢ بَيْنَكُمْ وَتَكَاثُرٌ فِى الْأَمْوَٰلِ وَالْأَوْلَٰدِ كَمَثَلِ غَيْثٍ أَعْجَبَ الْكُفَّارَ نَبَاتُهُۥ ثُمَّ يَهِيجُ فَتَرَىٰهُ مُصْفَرًّا ثُمَّ يَكُونُ حُطَٰمًا وَفِى الْـَٔاخِرَةِ عَذَابٌ شَدِيدٌ وَمَغْفِرَةٌ مِّنَ اللَّهِ وَرِضْوَٰنٌ وَمَا الْحَيَوٰةُ الدُّنْيَآ إِلَّا مَتَٰعُ الْغُرُورِ ﴿٢٠﴾ سَابِقُوٓا إِلَىٰ مَغْفِرَةٍ مِّن رَّبِّكُمْ وَجَنَّةٍ عَرْضُهَا كَعَرْضِ السَّمَآءِ وَالْأَرْضِ أُعِدَّتْ لِلَّذِينَ ءَامَنُوا بِاللَّهِ وَرُسُلِهِۦ ذَٰلِكَ فَضْلُ اللَّهِ يُؤْتِيهِ مَن يَشَآءُ وَاللَّهُ ذُو الْفَضْلِ الْعَظِيمِ ﴿٢١﴾ مَآ أَصَابَ مِن مُّصِيبَةٍ فِى الْأَرْضِ وَلَا فِىٓ أَنفُسِكُمْ إِلَّا فِى كِتَٰبٍ مِّن قَبْلِ أَن نَّبْرَأَهَآ إِنَّ ذَٰلِكَ عَلَى اللَّهِ يَسِيرٌ ﴿٢٢﴾ لِّكَيْلَا تَأْسَوْا عَلَىٰ مَا فَاتَكُمْ وَلَا تَفْرَحُوا بِمَآ ءَاتَىٰكُمْ وَاللَّهُ لَا يُحِبُّ كُلَّ مُخْتَالٍ فَخُورٍ ﴿٢٣﴾ الَّذِينَ يَبْخَلُونَ وَيَأْمُرُونَ النَّاسَ بِالْبُخْلِ وَمَن يَتَوَلَّ فَإِنَّ اللَّهَ هُوَ الْغَنِىُّ الْحَمِيدُ ﴿٢٤﴾

(١٩) ئەوانـەی کـە باوەڕیـان هێنـاوە بـەخواو پێغەمبەرەکانی، ئا ئەوانە راست و راستگۆکانن، شـەهیدەکانیش لای پـەروەردگاریان پاداشـت و نوور و روناکی تایبـەتی خۆیـان هەیـە، ئەوانـەش کـە باوەڕیـان نـەهێناوەو ئایـەت و فەرمانـەکانی ئێمـەیان بـەدرۆزانی، ئـا ئەوانـە نیشـتـەجێی دۆزەخن.

(٢٠) چاک بزانن ژیـانی دنیـا تەنهـا بریتیـە لـە یـاری و گـەمـو رازاندنـەوەو خۆ هەڵکێشـان لـە نێـوان یـەکتریدا، هـەروەها زۆرکردنـی سـامان و مـاڵ و منـداڵ، جا ئەوانـە هـەر هـەمووی وەک بارانێکی بەپیت وایە کە ببێتە هۆی بەرهەمێکی زۆر، کشـتیارەکان سەرسـام بکـات، لـەوەودوا وشک ببێت و زەرد هەڵگەڕێت، پاشان وردوخاش ببێت و بکەوێت، بێگومان لە قیامەتیشدا سزای زۆرسەخت بۆ دنیاپەرستان ئامادەیە، لەولاشەوە لێ خۆشبوون و رەزامـەندی لەلایـەن خـواوە ئیمانداران چاکـەخوازی لێ بـەهرەوەر دەکرێت، ژیانی دنیاش دوور لە خواناسی و دینـداری جگە لەوەی کە بریتیە لە رابواردنێکـی کـەم، شتێکی تـر نیـە، زۆر کەسیشـی پـێ غـەڕاو دەسـتخەڕۆ دەبێت.

(٢١) (کەواتـە) پێشبڕکێ بکـەن بـۆ بەدەسـت هێنانی لێ خۆشبوون لەلایەن پەروەردگارتانەوە و بەدەستهێنانی ئەو بەهەشتەی کە پانیەکەی وەک پانتایی ئاسمـان و زەویە، ئامادەکراوە بۆ ئەوانەی کە ئیمان و باوەڕیان هێناوە بە خـواو پێغەمبـەرەکانی، ئـەوەش خـۆی زیـادە رێزێکی تایبەتیە لەلایەن خواوە دەیدات بەو کەسانەی کە خۆی دەیەوێت، هەر خوا خۆی خـاوەنی بەخشش و بەخشندەیی زۆر گەورە و بێسنوورە .

(٢٢) هیچ بەڵاو رووداوێک لە زەویدا، بۆتان پێش نەهاتووە کە لە ـ لـوح المحفوظ ـ دا تۆمارمـان نـەکردبێت، پێش ئەوەی رووداوەکە پێش بێت، ئەو کارەش بۆ خوا زۆر ئاسانە.

(٢٣) ئەمەش بۆ ئەوەی کە خەفەت نەخۆن بۆ ئەوەی لە کیستان چووە و بـەوەش دڵخۆش و غـەڕڕا نـەبن کـە پێمـان بەخشیوون (واتـە کەشخە نەکـەن)، چونکـە خـوا کەسـانی خۆ بەگـەورەزان و فەخرفرۆشی خۆش نـاوێت (ئەوانـەی بەبەخشینی بەهرەکان غەڕڕا دەبن و خۆ بادەدەن و فیز دەکەن)...

(٢٤) یاخود رەزیلی دەکەن و فەرمان دەکەن بەخەڵکیش کە رەزیل بـن و مـاڵ و سـامان نەبەخشـن (بۆ بـەرژەوەندی گشتی، یان بە هەژاران و لێقەوماوان)، جا ئەوەی پشـت هـەڵکات لـە فەرمانـەکانی خـواو دەسـت نوقـاو بێـت، ئـەوە بێگومان با چاک بزانێت کە خوا هەر خۆی بێنیازە و سوپاسکراوە لەسەر بەخششە بێسنوورەکانی.

لَقَدْ أَرْسَلْنَا رُسُلَنَا بِالْبَيِّنَاتِ وَأَنزَلْنَا مَعَهُمُ الْكِتَابَ وَالْمِيزَانَ لِيَقُومَ النَّاسُ بِالْقِسْطِ ۖ وَأَنزَلْنَا الْحَدِيدَ فِيهِ بَأْسٌ شَدِيدٌ وَمَنَافِعُ لِلنَّاسِ وَلِيَعْلَمَ اللَّهُ مَن يَنصُرُهُ وَرُسُلَهُ بِالْغَيْبِ ۚ إِنَّ اللَّهَ قَوِيٌّ عَزِيزٌ ﴿٢٥﴾ وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا نُوحًا وَإِبْرَاهِيمَ وَجَعَلْنَا فِي ذُرِّيَّتِهِمَا النُّبُوَّةَ وَالْكِتَابَ ۖ فَمِنْهُم مُّهْتَدٍ ۖ وَكَثِيرٌ مِّنْهُمْ فَاسِقُونَ ﴿٢٦﴾ ثُمَّ قَفَّيْنَا عَلَىٰ آثَارِهِم بِرُسُلِنَا وَقَفَّيْنَا بِعِيسَى ابْنِ مَرْيَمَ وَآتَيْنَاهُ الْإِنجِيلَ وَجَعَلْنَا فِي قُلُوبِ الَّذِينَ اتَّبَعُوهُ رَأْفَةً وَرَحْمَةً وَرَهْبَانِيَّةً ابْتَدَعُوهَا مَا كَتَبْنَاهَا عَلَيْهِمْ إِلَّا ابْتِغَاءَ رِضْوَانِ اللَّهِ فَمَا رَعَوْهَا حَقَّ رِعَايَتِهَا ۖ فَآتَيْنَا الَّذِينَ آمَنُوا مِنْهُمْ أَجْرَهُمْ ۖ وَكَثِيرٌ مِّنْهُمْ فَاسِقُونَ ﴿٢٧﴾ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اتَّقُوا اللَّهَ وَآمِنُوا بِرَسُولِهِ يُؤْتِكُمْ كِفْلَيْنِ مِن رَّحْمَتِهِ وَيَجْعَل لَّكُمْ نُورًا تَمْشُونَ بِهِ وَيَغْفِرْ لَكُمْ ۚ وَاللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿٢٨﴾ لِّئَلَّا يَعْلَمَ أَهْلُ الْكِتَابِ أَلَّا يَقْدِرُونَ عَلَىٰ شَيْءٍ مِّن فَضْلِ اللَّهِ ۙ وَأَنَّ الْفَضْلَ بِيَدِ اللَّهِ يُؤْتِيهِ مَن يَشَاءُ ۚ وَاللَّهُ ذُو الْفَضْلِ الْعَظِيمِ ﴿٢٩﴾

(٢٥) سوێند بەخوا بێگومان ئێمە پێغەمبەرەکانمان رەوانە کردووە هاوڕێ لەگەڵ بەڵگە و نیشانەو موعجیزەی روون و ئاشکراداو کتێبە ئاسمانیەکانیشمان هێنایە خوارەوە کە لەگەڵ ئەو پێغەمبەرانەدا بێت، تەرازوو پێوەری شەرعی و دادپەروەرانەمان بۆ روون کردونەتەوە تا خەڵکی بەعەدالەت و دادپەروەریی رەفتار بکەن، هەروەها ئاسنیشمان دروست کردووە کە ماددەیەکی سەخت و رەقە و سوود بەخشیشە بۆ خەڵکی، تا ئەوەی خوا دەیزانێ لە جیهانی واقعیشدا دەربکەوێت کەکێ پشتگیرو لایەنگری خواو پێغەمبەرەکانیەتی لەکاتێکدا کە ئەو زاتە پەنهانە، چونکە بەڕاستی خوا بەهێزو باڵادەستە.

(٢٦) بێگومان ئێمە نوح و ئیبراهیممان رەوانە کردووە، لە نەوەکانیشیاندا پێغەمبەرایەتی و کتێبی ئاسمانیمان دابەزاندووە، جا لە نەوەکانیاندا کەسانێک هەبوون کە رێگە و رێبازی هیدایەت و خواناسی گرتۆتەبەر، زۆربەشیان خوانەناس و لارو وێر بوون.

(٢٧) لەوەودوا بە شوێن پێغەمبەراندا پێغەمبەرانی ترمان رەوانە کرد، کۆتایی زنجیرەی ئیسحاقی کوڕی ئیبراهیممان هێنا بە عیسای کوڕی مەریەم، ئینجیلیشمان پێبەخشی، سۆزو میهرەبانیمان لە دڵی ئەوانەدا کە شوێنی کەوتبوون دابین کرد، بەڵام ئەوان رەهبانیەت و دوورە پەرێزیان لە دنیادا کردە پیشەیان، وەنەبێت ئێمە ئەو حاڵەتەمان لەسەر فەرز کردبن، بەڵکو تەنها بەدەستهێنانی رەزامەندی خوامان لێ داوا کردبوون، کەچی ئەوان رەهبانی‌یەتیان بەچاکی پەیڕەو نەکرد، ئێمەش پاداشتی ئەوانەمان دایەوە کە باوەڕی راست و دروستیان هەبوو، هەرچەندە زۆربەیان لارو وێرو خوانەناس و یاخی دەرچوون.

(٢٨) ئەی ئەو کەسانەی کە باوەڕتان هێناوە لە خوا بترسن و پارێزکاربن و باوەڕی پتەو بهێنن بە پێغەمبەرەکەی، تا دوو بەرابەر پاداشت و رەحمەتتان بەسەردا ببارێنێت، هەروەها نوور و روناکیەتان پێ ببەخشێت لەبەر رۆشناییەکەی دا چالاکی بنوێنن و رێبازی ژیان بگرنەبەر، تا لێتان خۆش ببێت، چونکە ئەو خوایە لێخۆشبوو میهرەبانە.

(٢٩) جا ئیتر خاوەنی کتێبە ئاسمانیەکان، با بزانن کە ناتوانن چوارچێوە دانێن بۆ بەخشندەیی و رەحمەت و میهرەبانی خوا، خۆیان بە هەڵبژاردەی خوا بزانن، چونکە بەخشش و رەحمەت؛ تەنها بەدەستی خوایە و هەر ئەو دەیبەخشێت بەوانەی کە خۆی دەیەوێت، ئەو خوایە خاوەنی بەخشش و رێزو میهرەبانیەکی گەورە و بێسنوورە.

سُورَةُ المُجَادَلَةِ

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

قَدْ سَمِعَ اللَّهُ قَوْلَ الَّتِي تُجَادِلُكَ فِي زَوْجِهَا وَتَشْتَكِي إِلَى اللَّهِ وَاللَّهُ يَسْمَعُ تَحَاوُرَكُمَا ۚ إِنَّ اللَّهَ سَمِيعٌ بَصِيرٌ (١) الَّذِينَ يُظَاهِرُونَ مِنكُم مِّن نِّسَائِهِم مَّا هُنَّ أُمَّهَاتِهِمْ ۖ إِنْ أُمَّهَاتُهُمْ إِلَّا اللَّائِي وَلَدْنَهُمْ ۚ وَإِنَّهُمْ لَيَقُولُونَ مُنكَرًا مِّنَ الْقَوْلِ وَزُورًا ۚ وَإِنَّ اللَّهَ لَعَفُوٌّ غَفُورٌ (٢) وَالَّذِينَ يُظَاهِرُونَ مِن نِّسَائِهِمْ ثُمَّ يَعُودُونَ لِمَا قَالُوا فَتَحْرِيرُ رَقَبَةٍ مِّن قَبْلِ أَن يَتَمَاسَّا ۚ ذَٰلِكُمْ تُوعَظُونَ بِهِ ۚ وَاللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرٌ (٣) فَمَن لَّمْ يَجِدْ فَصِيَامُ شَهْرَيْنِ مُتَتَابِعَيْنِ مِن قَبْلِ أَن يَتَمَاسَّا ۖ فَمَن لَّمْ يَسْتَطِعْ فَإِطْعَامُ سِتِّينَ مِسْكِينًا ۚ ذَٰلِكَ لِتُؤْمِنُوا بِاللَّهِ وَرَسُولِهِ ۚ وَتِلْكَ حُدُودُ اللَّهِ ۗ وَلِلْكَافِرِينَ عَذَابٌ أَلِيمٌ (٤) إِنَّ الَّذِينَ يُحَادُّونَ اللَّهَ وَرَسُولَهُ كُبِتُوا كَمَا كُبِتَ الَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ ۚ وَقَدْ أَنزَلْنَا آيَاتٍ بَيِّنَاتٍ ۚ وَلِلْكَافِرِينَ عَذَابٌ مُّهِينٌ (٥) يَوْمَ يَبْعَثُهُمُ اللَّهُ جَمِيعًا فَيُنَبِّئُهُم بِمَا عَمِلُوا ۚ أَحْصَاهُ اللَّهُ وَنَسُوهُ ۚ وَاللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ شَهِيدٌ (٦)

سوورەتی (المـجـادلة)

بەناوی خوای بەخشندە و میهرەبان

(١) ئەی محمد ﷺ بێگومان خوا بیستی و وەریگرت وتووێژی ئەو ئافرەتەی کە گفتوگۆت لەگەڵدا دەکات دەربارەی هاوسەرەکەی، سکاڵای خۆیشی بۆلای خوا دەبات، خوایش گوێی لە گفتوگۆکەتان بوو، بەڕاستی خوا بیسەرو بینایە.

(چوار ئایەتی سەرەتای ئەم سوورەتە دەربارەی خەولەی کچی ثەعلەبەو مێردەکەی هاتۆتە خوارەوە.. رۆژێک مێردەکەی لێی توورە دەبێت و پێی دەڵێت: تۆ لەجێگەی دایکمی، خەولە دێت بۆ خزمەتی پێغەمبەر ﷺ، باسەکەی بۆ دەگێڕێتەوە، دوای تاوێک حاڵەتی وەحی بەسەر پێغەمبەردا دێت و چوار ئایەتی سەرەتای ئەم سوورەتە دادەبەزێت).

(٢) ئەوانەتان بەهاوسەرانیان دەڵێن: تۆ لەجێگەی دایکمدایت، هاوسەرەکەیان بەو قسەیە نابنە دایکیان، چونکە دایکیان تەنها ئەوانەن کە ئەوانیان لێ بووە، ئەوانە قسەیەکی نابەجێ دەکەن وبوختانێکی ناپەسەند دەڵێن، بێگومان خوا چاوپۆشی دەکات و لێخۆش دەبێت (ئەگەر ئەوانە پەشیمان ببنەوە و داوای لێخۆشبوون بکەن)...

(٣) ئەوانەی وا بە هاوسەرەکانیان دەڵێن و دوایی پەشیمان دەبنەوە لەوەی کە وتویانە، ئەوە دەبێت کۆیلەیەک ئازاد بکەن پێش ئەوەی ئەو ژن و مێردە بەیەک بگەن، ئەو بڕیارە ئێوەی پێ ئامۆژگاری دەکرێت، خوایش ئاگادارە بەو کاروکردەوانەی ئەنجامی دەدەن...

(٤) ئینجا ئەوەی کۆیلەی دەست نەکەوت، ئەوە دەبێت دوو مانگ لەسەر یەک بەڕۆژوو بێت پێش بەیەکگەیشتنیان، جا ئەوەی ناتوانێت بەڕۆژوو بێت، با شەست هەژار تێر بکات لە ژەمێک خواردن، ئەوەی کە باسکرا بۆ ئەوەیە باوەڕتان پتەو بێت بەخواو پێغەمبەرەکەی (چونکە خوا چارەسەر دادەنێت بۆ گیروگرفتەکان)، ئەو بڕیارانەش سنووری خوان، بۆ ئەوانەش کە کافرن (ملکەچی فەرمانی خوا نابن) سزای بە ئێش و ئازار بۆیان ئامادەیە.

(٥) بەڕاستی ئەوانەی دژایەتی و دوژمنایەتی خواو پێغەمبەرەکەی دەکەن، سەرشۆڕ و خەجاڵەت و شکست خوردەن، هەروەک ئەوانەی پێش ئەمان کە سەرشۆڕو خەجاڵەت کران و تێکشکان، بێگومان ئێمە بەڵگە و نیشانەی روون و ئاشکرامان ناردۆتە خوارەوە لەسەر ئەو راستیانە، جا بۆ ئەوانەی کە کافرو بێباوەڕن سزای ریسواکەر ئامادەیە...

(٦) لە رۆژێکدا کە خوا هەموویان زیندوو دەکاتەوە پێکەوە، ئەوسا هەواڵی هەموو کاروکردەوەکانیان پێ رادەگەیەنێت، خوا ئاماری کردووە ئەوان فەرامۆشیان کردووە، خوایش شایەت و ئاگایە بەسەر هەموو شتێکدا.

أَلَمْ تَرَ أَنَّ ٱللَّهَ يَعْلَمُ مَا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِى ٱلْأَرْضِ مَا يَكُونُ
مِن نَّجْوَىٰ ثَلَٰثَةٍ إِلَّا هُوَ رَابِعُهُمْ وَلَا خَمْسَةٍ إِلَّا هُوَ سَادِسُهُمْ
وَلَآ أَدْنَىٰ مِن ذَٰلِكَ وَلَآ أَكْثَرَ إِلَّا هُوَ مَعَهُمْ أَيْنَ مَا كَانُوا۟ ثُمَّ يُنَبِّئُهُم
بِمَا عَمِلُوا۟ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ إِنَّ ٱللَّهَ بِكُلِّ شَىْءٍ عَلِيمٌ ﴿٧﴾ أَلَمْ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ
نُهُوا۟ عَنِ ٱلنَّجْوَىٰ ثُمَّ يَعُودُونَ لِمَا نُهُوا۟ عَنْهُ وَيَتَنَٰجَوْنَ بِٱلْإِثْمِ
وَٱلْعُدْوَٰنِ وَمَعْصِيَتِ ٱلرَّسُولِ وَإِذَا جَآءُوكَ حَيَّوْكَ بِمَا لَمْ يُحَيِّكَ
بِهِ ٱللَّهُ وَيَقُولُونَ فِىٓ أَنفُسِهِمْ لَوْلَا يُعَذِّبُنَا ٱللَّهُ بِمَا نَقُولُ حَسْبُهُمْ
جَهَنَّمُ يَصْلَوْنَهَا فَبِئْسَ ٱلْمَصِيرُ ﴿٨﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ إِذَا
تَنَٰجَيْتُمْ فَلَا تَتَنَٰجَوْا۟ بِٱلْإِثْمِ وَٱلْعُدْوَٰنِ وَمَعْصِيَتِ ٱلرَّسُولِ وَتَنَٰجَوْا۟
بِٱلْبِرِّ وَٱلتَّقْوَىٰ وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ ٱلَّذِىٓ إِلَيْهِ تُحْشَرُونَ ﴿٩﴾ إِنَّمَا ٱلنَّجْوَىٰ
مِنَ ٱلشَّيْطَٰنِ لِيَحْزُنَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَلَيْسَ بِضَآرِّهِمْ شَيْـًٔا
إِلَّا بِإِذْنِ ٱللَّهِ وَعَلَى ٱللَّهِ فَلْيَتَوَكَّلِ ٱلْمُؤْمِنُونَ ﴿١٠﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ
ءَامَنُوٓا۟ إِذَا قِيلَ لَكُمْ تَفَسَّحُوا۟ فِى ٱلْمَجَٰلِسِ فَٱفْسَحُوا۟ يَفْسَحِ
ٱللَّهُ لَكُمْ وَإِذَا قِيلَ ٱنشُزُوا۟ فَٱنشُزُوا۟ يَرْفَعِ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟
مِنكُمْ وَٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْعِلْمَ دَرَجَٰتٍ وَٱللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرٌ ﴿١١﴾

(٧) ئایا سەرنجت نەداوە کە بەڕاستی خوا بە هەرچی لە ئاسمانەکان و زەویدا هەیە زانا و ئاگایە، سێ کەس نیە چپە بکەن بەیەکەوە خوا چوارەمیان نەبێت، پێنج کەس نیە ئەو زاتە شەشەمیان نەبێت، لەو ژمارانە کەمتر یان زیاتریش نیە کە ئەو لایان نەبێت و ئاگادار نەبێت بە سرتە و چپەیان، لەهەر شوێنێک و لەهەر کوێدا بن، پاشان لە ڕۆژی قیامەتدا ئاگاداریان دەکاتەوە بە هەموو ئەو کارو کردەوانەی کە ئەنجامیانداوە، چونکە بەڕاستی خوا بە هەموو شتێک زانایە.

(٨) ئایا سەرنجت نەداوە لەوانەی قەدەغەی چپەیان لێ کراوە، کەچی لەوەودوا هەر دەگەڕێنەوە سەر ئەو ڕەفتارەی کە لێیان قەدەغەکراوە، بەردەوام خەریکی چپەیەکن کە هەمووی گوناهو دوژمنایەتی و نافەرمانی پێغەمبەرە، کاتێکیش دێن بۆ لات جۆرێک سلاوت لێ دەکەن، کە خوا بەو شێوەیە سلاوی لێ نەکردویت!! بەگاڵتەوە دەڵێن: ئەوە بۆچی خوا سزامان نادات بەهۆی ئەو قسانەوە کە دەیڵێین!! ئەوانە دۆزەخیان بەسە کە بچنە ناوی و ببرژێنرێن تیایدا، ئای کە سەرەنجامێکی خراپە.

(٩) ئەی ئەو کەسانەی باوەڕتان هێناوە کاتێک چپە دەکەن بەیەکەوە، چپەیەک مەکەن کە گوناهو دوژمنایەتی و نافەرمانی پێغەمبەر بێت، با چپەکانتان هەمووی دەربارەی چاکە و خواناسی و پارێزکاری بێت، لەو خوایە بترسن کە هەر بۆ لای ئەو کۆدەکرێنەوە (بۆ لێپرسینەوە).

(١٠) بەڕاستی چپەی خراپ و نابەجێ هەر لە شەیتانەوەیە، تا ئەوانە غەمبار بکات کە باوەڕیان هێناوە، وەنەبێت ئەو چپەیە هیچ زیانێکیان پێبگەیەنێت مەگەر ویستی خوای لەسەر بێت، دەبا ئیمانداران هەر پشت بە خوا ببەستن تا لە زیان بە دوور بن.

(١١) ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە کاتێک لە دانیشتن و کۆبونەوەکاندا پێتان دەوترێت: ڕێ بدەن بەکەسانی ترو ئەڵقەی دانیشتنەکە فراوان بکەن، ئەوە ئێوەش فراوانی بکەن، ئەگەر ئێوە واتان کرد خوا پاداشتی فراوانتان پێ دەبەخشێت، کاتێکیش پێتان دەوترێت هەستن و جێگە چۆڵ بکەن، (بۆ پیاوماقووڵ و ریش سپی و گەورەکانتان) جێگە چۆڵ بکەن، جا ئەگەر واتان کرد خوای گەورە ئەوانەی ئیمانیان هێناوە لە ئێوە و ئەوانەشتان زانست و زانیاریان پێدراوە چەندەها پلەو پایە بەرزیان دەکاتەوە، خوایش ئاگایە بەو کاروکردەوانەی کە ئەنجامی دەدەن.

يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا نَٰجَيْتُمُ ٱلرَّسُولَ فَقَدِّمُواْ بَيْنَ يَدَيْ نَجْوَىٰكُمْ صَدَقَةً ۚ ذَٰلِكَ خَيْرٌ لَّكُمْ وَأَطْهَرُ ۚ فَإِن لَّمْ تَجِدُواْ فَإِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿١٢﴾ ءَأَشْفَقْتُمْ أَن تُقَدِّمُواْ بَيْنَ يَدَيْ نَجْوَىٰكُمْ صَدَقَٰتٍ ۚ فَإِذْ لَمْ تَفْعَلُواْ وَتَابَ ٱللَّهُ عَلَيْكُمْ فَأَقِيمُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتُواْ ٱلزَّكَوٰةَ وَأَطِيعُواْ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ ۚ وَٱللَّهُ خَبِيرٌۢ بِمَا تَعْمَلُونَ ﴿١٣﴾ ۞ أَلَمْ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ تَوَلَّوْاْ قَوْمًا غَضِبَ ٱللَّهُ عَلَيْهِم مَّا هُم مِّنكُمْ وَلَا مِنْهُمْ وَيَحْلِفُونَ عَلَى ٱلْكَذِبِ وَهُمْ يَعْلَمُونَ ﴿١٤﴾ أَعَدَّ ٱللَّهُ لَهُمْ عَذَابًا شَدِيدًا ۖ إِنَّهُمْ سَآءَ مَا كَانُواْ يَعْمَلُونَ ﴿١٥﴾ ٱتَّخَذُوٓاْ أَيْمَٰنَهُمْ جُنَّةً فَصَدُّواْ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ فَلَهُمْ عَذَابٌ مُّهِينٌ ﴿١٦﴾ لَّن تُغْنِيَ عَنْهُمْ أَمْوَٰلُهُمْ وَلَآ أَوْلَٰدُهُم مِّنَ ٱللَّهِ شَيْـًٔا ۚ أُوْلَٰٓئِكَ أَصْحَٰبُ ٱلنَّارِ ۖ هُمْ فِيهَا خَٰلِدُونَ ﴿١٧﴾ يَوْمَ يَبْعَثُهُمُ ٱللَّهُ جَمِيعًا فَيَحْلِفُونَ لَهُۥ كَمَا يَحْلِفُونَ لَكُمْ ۖ وَيَحْسَبُونَ أَنَّهُمْ عَلَىٰ شَىْءٍ ۚ أَلَآ إِنَّهُمْ هُمُ ٱلْكَٰذِبُونَ ﴿١٨﴾ ٱسْتَحْوَذَ عَلَيْهِمُ ٱلشَّيْطَٰنُ فَأَنسَىٰهُمْ ذِكْرَ ٱللَّهِ ۚ أُوْلَٰٓئِكَ حِزْبُ ٱلشَّيْطَٰنِ ۚ أَلَآ إِنَّ حِزْبَ ٱلشَّيْطَٰنِ هُمُ ٱلْخَٰسِرُونَ ﴿١٩﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ يُحَآدُّونَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥٓ أُوْلَٰٓئِكَ فِى ٱلْأَذَلِّينَ ﴿٢٠﴾ كَتَبَ ٱللَّهُ لَأَغْلِبَنَّ أَنَا۠ وَرُسُلِىٓ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ قَوِىٌّ عَزِيزٌ ﴿٢١﴾



(١٢) ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە کاتێک ویستتان چپەیەک یان قسەیەکی نهێنی لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ بکەن، پێش ئەو کارە خێرێک بکەن (بەگوێرەی توانا شتێک ببەخشن بەهەژاران)، ئەوە چاکترە بۆتان و خاوێنترە، خۆ ئەگەر نەتان بوو، ئەوە چاک بزانن کە خوا لێ خۆشبوو میهرەبانە.

(١٣) ئایا دەترسان لە هەژاری پێش ئەوەی کە بە نهێنی قسە بکەن، خێرو چاکەیەک ئەنجام بدەن؟! جا کاتێکیش کە نەتانکرد خوا هەر لێتان خۆش بوو، دە ئیتر ئێوە نوێژەکانتان بەچاکی ئەنجام بدەن و زەکات بدەن و فەرمانبەرداریی خواو پێغەمبەرەکەی بکەن، خوایش زۆر ئاگایە بەو کاروکردەوانەی کە ئەنجامی دەدەن.

(١٤) ئایا سەرنجی ئەوانەت نەداوە پشتگیریان لە هۆزێک کرد، کە خوا خەشمی لێ گرتوون و رقی لێیانە، ئەو دووڕووانە نە سەر بە ئێوەن، نە سەر بەوانیشن، سوێند لەسەر درۆ دەخۆن لە کاتێکدا کە خۆشیان دەزانن...

(١٥) خوا سزایەکی سەخت و بەتینی بۆ ئامادە کردوون، بەڕاستی ئەوەی ئەوان دەیانکرد رەفتارێکی ناشرین و کارێکی نابەجێ بوو.

(١٦) ئەوانە سوێندەکانیان کردووە بەقەڵغان بۆ خۆیان تا سەروماڵیان سەلامەت بێت، بەو هۆیەشەوە بەربەستیان داناوە لەبەردەم بەرەو پێش چوونی رێبازی خوادا، هەر بۆیەش سزاو ئازارێکی سەرشۆڕکەر بۆیان ئامادەیە.

(١٧) نە ماڵ و سامانیان نە رۆڵەکانیان هەرگیز نابنە هۆی ئەوەی کە لە دەست تۆڵەی خوا رزگاریان بکات، ئەوانە نیشتەجێی ناو دۆزەخن و تیایدا بۆ هەمیشە بەزیندوویی دەمێننەوە.

(١٨) لەو رۆژەدا کە خوا هەموویان زیندوو دەکاتەوە، دەست دەکەنەوە بە سوێند خواردن هەروەک بۆ ئێوە سوێندیان دەخوارد، لە کاتێکدا وادەزانن کە رزگاریان دەبێت و شتێکیان دەست دەکەوێت!! (خوای گەورە لەناو خەڵکیدا ریسوایان دەکات و دەفەرموێت): ئاگاداربن کە بەڕاستی هەر ئەوان درۆزنن.

(١٩) ئەوانە شەیتان زاڵ بووە بەسەریانداو داگیری کردوون، بەو هۆیەوە یادی خوای لەبیر بردوون، ئا ئەوانە دەستە و تاقم و حزبی شەیتانن، ئاگاداربن کە بێگومان دەستە و تاقم و حزبی شەیتان خەسارەتمەند و زەرەمەندن.

(٢٠) بەڕاستی ئەوانەی دژایەتی خواو پێغەمبەرەکەی دەکەن ئا ئەوانە لە نزمترینترینی خەڵکین لە دنیاو قیامەتدا.

(٢١) خوا بڕیاریداوە کە: بێگومان هەر خۆم و پێغەمبەرەکانم سەرکەوتوو دەبین، چونکە بەڕاستی هەر خوا خۆی بەهێزو باڵادەستە.

لَا تَجِدُ قَوْمًا يُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ يُوَادُّونَ مَنْ حَادَّ اللَّهَ وَرَسُولَهُ وَلَوْ كَانُوا آبَاءَهُمْ أَوْ أَبْنَاءَهُمْ أَوْ إِخْوَانَهُمْ أَوْ عَشِيرَتَهُمْ أُولَٰئِكَ كَتَبَ فِي قُلُوبِهِمُ الْإِيمَانَ وَأَيَّدَهُمْ بِرُوحٍ مِنْهُ وَيُدْخِلُهُمْ جَنَّاتٍ تَجْرِي مِنْ تَحْتِهَا الْأَنْهَارُ خَالِدِينَ فِيهَا رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمْ وَرَضُوا عَنْهُ أُولَٰئِكَ حِزْبُ اللَّهِ أَلَا إِنَّ حِزْبَ اللَّهِ هُمُ الْمُفْلِحُونَ ﴿٢٢﴾

سُورَةُ الْحَشْرِ

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

سَبَّحَ لِلَّهِ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الْأَرْضِ وَهُوَ الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ ﴿١﴾ هُوَ الَّذِي أَخْرَجَ الَّذِينَ كَفَرُوا مِنْ أَهْلِ الْكِتَابِ مِنْ دِيَارِهِمْ لِأَوَّلِ الْحَشْرِ مَا ظَنَنْتُمْ أَنْ يَخْرُجُوا وَظَنُّوا أَنَّهُمْ مَانِعَتُهُمْ حُصُونُهُمْ مِنَ اللَّهِ فَأَتَاهُمُ اللَّهُ مِنْ حَيْثُ لَمْ يَحْتَسِبُوا وَقَذَفَ فِي قُلُوبِهِمُ الرُّعْبَ يُخْرِبُونَ بُيُوتَهُمْ بِأَيْدِيهِمْ وَأَيْدِي الْمُؤْمِنِينَ فَاعْتَبِرُوا يَا أُولِي الْأَبْصَارِ ﴿٢﴾ وَلَوْلَا أَنْ كَتَبَ اللَّهُ عَلَيْهِمُ الْجَلَاءَ لَعَذَّبَهُمْ فِي الدُّنْيَا وَلَهُمْ فِي الْآخِرَةِ عَذَابُ النَّارِ ﴿٣﴾

(٢٢) کەسانێکت دەست ناکەوێت باوەڕ بهێنن بە خواو بە ڕۆژی دوایی، لەکاتێکدا کەسانێکیان خۆش بوێت کە دژایەتی خواو پێغەمبەرەکەیان کردبێت، ئەگەرچی ئەو دوژمنانە باوو باپیریان بن یان نەوەیان بن یان برایان بن یان عەشرەتیان بن، ئەوانەی کە بەو شێوەیەن (ئیمان و باوەڕیان لە هەموو کەسێک لا بە نرخترو پیرۆزترە)، خوا ئیمان و باوەڕی لەدڵیاندا چەسپاندووەو جێگیری کردووەو لە بەهرەو میهرەبانی تایبەتی خۆی، وە بە هێزو گیانێکی تایبەتی لەلایەن خۆیەوە (مەبەست قورئان و ئیمانە) پشتگیری کردوون و یارمەتی داون، سەرئەنجامیش دەیانخاتە باخەکانی بەهەشتەوە کە چەندەها ڕوبار بەژێر درەخت و کۆشکەکانیدا تێدەپەڕێت، هاوڕێ لەگەڵ ژیانی نەبڕاوەدا، ئەوانە خوا لێیان ڕازیە و ئەوانیش لە خوا ڕازین، ئا ئەوانە دەستەو تاقم و حزب و لایەنی خوای گەورەن، ئاگاداربن کە بەڕاستی هەر لایەن و حزب و دەستە و تاقمی خوا سەرکەوتوو و سەرفرازن.

سوورەتی (الـحـشـر)

بەناوی خوای بەخشندە و میهرەبان

(١) هەرچی لە ئاسمانەکان و زەویدا هەیە بەپاکی و بێگەردی یادی خوایان کردووە، هەر ئەویش باڵادەست و دانایە.

(٢) ئەو خوایە ئەو زاتەیە، ئەوانەی بێباوەڕ بوون لە خاوەنانی کتێب، هەڵیکەندن لە شوێنەواریان و ناچاری کۆچی کردن لە یەکەم دەست پێکردنی کۆکردنەوەو دەرکردنیاندا، ئێوە بەتەما نەبوون و گومانتان نەدەبرد ئاوا بەئاسانی بڕۆن، ئەوانیش گومانیان وابوو کە بەڕاستی قەڵاکانیان بەرگریان دەکات لە ویست و فەرمانی خوا، ئەوسا ئیتر لە لایەکەوە خوا بەڵای بەسەر هێنان کە بەخەیاڵیاندا نەهاتبوو و حسابیان بۆ نەکردبوو، ئەوسا خوا ترسێکی فڕێدایە دڵیانەوە، بەناچاریی دەستیان کرد بەکاولکردنی خانووبەرەو ماڵەکانیان بەدەستی خۆیان و دەستی ئیمانداران، کەواتە: ئەی خاوەن بیروهۆش و دوور بینەکان دەرس و پەندو ئامۆژگاری وەربگرن (جوولەکە هەروا بۆیان ناچێتە سەر).

(٣) خۆ ئەگەر خوا چۆڵکردنی لەسەر بڕیار نەدانایە، ئەوە هەر لە دنیادا سزای دەدان، لە قیامەتیشدا سزای ئاگری دۆزەخ بۆیان ئامادەیە (چونکە زۆر دڵڕەق و پیلانگێڕن).

ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ شَاقُّوا اللَّهَ وَرَسُولَهُ ۖ وَمَن يُشَاقِّ اللَّهَ فَإِنَّ اللَّهَ شَدِيدُ الْعِقَابِ ﴿٤﴾ مَا قَطَعْتُم مِّن لِّينَةٍ أَوْ تَرَكْتُمُوهَا قَائِمَةً عَلَىٰ أُصُولِهَا فَبِإِذْنِ اللَّهِ وَلِيُخْزِيَ الْفَاسِقِينَ ﴿٥﴾ وَمَا أَفَاءَ اللَّهُ عَلَىٰ رَسُولِهِ مِنْهُمْ فَمَا أَوْجَفْتُمْ عَلَيْهِ مِنْ خَيْلٍ وَلَا رِكَابٍ وَلَٰكِنَّ اللَّهَ يُسَلِّطُ رُسُلَهُ عَلَىٰ مَن يَشَاءُ ۚ وَاللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ ﴿٦﴾ مَّا أَفَاءَ اللَّهُ عَلَىٰ رَسُولِهِ مِنْ أَهْلِ الْقُرَىٰ فَلِلَّهِ وَلِلرَّسُولِ وَلِذِي الْقُرْبَىٰ وَالْيَتَامَىٰ وَالْمَسَاكِينِ وَابْنِ السَّبِيلِ كَيْ لَا يَكُونَ دُولَةً بَيْنَ الْأَغْنِيَاءِ مِنكُمْ ۚ وَمَا آتَاكُمُ الرَّسُولُ فَخُذُوهُ وَمَا نَهَاكُمْ عَنْهُ فَانتَهُوا ۚ وَاتَّقُوا اللَّهَ ۖ إِنَّ اللَّهَ شَدِيدُ الْعِقَابِ ﴿٧﴾ لِلْفُقَرَاءِ الْمُهَاجِرِينَ الَّذِينَ أُخْرِجُوا مِن دِيَارِهِمْ وَأَمْوَالِهِمْ يَبْتَغُونَ فَضْلًا مِّنَ اللَّهِ وَرِضْوَانًا وَيَنصُرُونَ اللَّهَ وَرَسُولَهُ ۚ أُولَٰئِكَ هُمُ الصَّادِقُونَ ﴿٨﴾ وَالَّذِينَ تَبَوَّءُوا الدَّارَ وَالْإِيمَانَ مِن قَبْلِهِمْ يُحِبُّونَ مَنْ هَاجَرَ إِلَيْهِمْ وَلَا يَجِدُونَ فِي صُدُورِهِمْ حَاجَةً مِّمَّا أُوتُوا وَيُؤْثِرُونَ عَلَىٰ أَنفُسِهِمْ وَلَوْ كَانَ بِهِمْ خَصَاصَةٌ ۚ وَمَن يُوقَ شُحَّ نَفْسِهِ فَأُولَٰئِكَ هُمُ الْمُفْلِحُونَ ﴿٩﴾

(٤) ئەو سزایە بەهۆی ئەوەوە بوو بەراستی ئەوانە دژومنایەتی خواو پێغەمبەرەکەیان کرد، ئەوەش دژایەتی ئاینی خوا بکات، با چاک بزانێت خوا سزاو تۆڵەی زۆر بەئێش و ئازارە.

(٥) هەر درەختێکی تەڕتان بڕی بێت یان وازتان لیّ هێنابێت و لەسەر بنجی خۆی ما بێت (لە خەیبەردا)، بەفەرمانی خوا بووە و ویستی ئەوی لەسەرە، تا تاوانباران و لە سنوور دەرچووەکان سەرشۆڕ و خەجاڵەت بکات.

(٦) ئەو دەستکەوتانە، خوا لە جوولەکەی سەندووە و بەخشیویەتی بەپێغەمبەرەکەی، ئێوە هیچ خۆتان ماندوو نەکردبوو بۆ بەدەست هێنانی، نە بەسواری ئەسپ بۆی چووبوون نە بە سواری وشتر، بەڵکو ئەوە خوایە کە پێغەمبەرەکەی زاڵ دەکات بەسەر هەر دەستە و تاقمێکدا کە بیەوێت، خوایش دەستەڵاتی بەسەر هەموو شتێکدا هەیە.

(٧) ئەو دەستکەوتانەی، خوا بەخشی بە پێغەمبەرەکەی لە خەڵکی دێهات و شارەکانی جوو، ئەوە خوا بڕیاری لەسەرداوە کە بۆ پێغەمبەر و خزمانیەتی، بۆ هەتیوان و هەژاران و ڕێبوارانیشە، بۆ ئەوەی ئەو سامانە تەنها لە نێوان دەوڵەمەندەکانی ئێوەدا نەبێت، جا ئەوەی پێغەمبەر ﷺ پێی بەخشیوون وەری بگرن، هەر فەرمانێکی پێدان بەگوێی بکەن، قەدەغەی هەر شتێکی لیّ کردن مەیکەن، لە خوا بترسن؛ چونکە بەڕاستی خوا بەتوندی تۆڵە دەسێنێت.

(٨) هەروەها لەو دەستکەوتانە، بەشی کۆچبەرانی هەژار دەبێت بدرێت، ئەوانەی لە شوێنەوارو سامانیان دوور خراونەتەوەو دەرکراون، ئەوانە بەتەمای بەخششی خواو ڕەزامەندیی ئەون و بەبیّ هیچ تەماعێکێ پشتیوانی لە خواو پێغەمبەرەکەی دەکەن و هەوڵی سەرخستنی بەرنامەکەیان دەدەن، هەر ئا ئەوانە ڕاستگۆو ڕاستانن.

(٩) ئەوانەی کە پێشتر ماڵ و شوێنی خۆیان ئامادە کرد بۆ پێشوازیی لە کۆچبەران و دڵ و دەروونی خۆیان ڕازاندەوە بەئیمان، ئەوانەشیان خۆش دەوێت کە کۆچیان کردووە بۆ لایان و لە دڵ و دەروونیاندا جێی هیچ جۆرە حەسوودی و بەخیلیەکێ نابێتەوە (لەسەر ئەوەی کە بەشی کۆچبەران دراوە و بەشی ئەوان نەدراوە)، حەز بە بەخشینی دەستکەوتەکان بەوان دەکەن، فەزڵی ئەوان دەدەن بەسەر خۆیاندا هەرچەندە هەژارو نەداریشن، جا ئەوەی خۆی لە نەفسی ڕەزیلی بپارێزێت و زاڵ بێت بەسەریدا ، ئا ئەوانە هەر سەرفرازن.



وَٱلَّذِينَ جَآءُو مِنۢ بَعۡدِهِمۡ يَقُولُونَ رَبَّنَا ٱغۡفِرۡ لَنَا
وَلِإِخۡوَٰنِنَا ٱلَّذِينَ سَبَقُونَا بِٱلۡإِيمَٰنِ وَلَا تَجۡعَلۡ فِي قُلُوبِنَا
غِلّٗا لِّلَّذِينَ ءَامَنُواْ رَبَّنَآ إِنَّكَ رَءُوفٞ رَّحِيمٌ ﴿١٠﴾ ۞ أَلَمۡ تَرَ إِلَى
ٱلَّذِينَ نَافَقُواْ يَقُولُونَ لِإِخۡوَٰنِهِمُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ مِنۡ أَهۡلِ
ٱلۡكِتَٰبِ لَئِنۡ أُخۡرِجۡتُمۡ لَنَخۡرُجَنَّ مَعَكُمۡ وَلَا نُطِيعُ فِيكُمۡ
أَحَدًا أَبَدٗا وَإِن قُوتِلۡتُمۡ لَنَنصُرَنَّكُمۡ وَٱللَّهُ يَشۡهَدُ إِنَّهُمۡ لَكَٰذِبُونَ
﴿١١﴾ لَئِنۡ أُخۡرِجُواْ لَا يَخۡرُجُونَ مَعَهُمۡ وَلَئِن قُوتِلُواْ لَا يَنصُرُونَهُمۡ
وَلَئِن نَّصَرُوهُمۡ لَيُوَلُّنَّ ٱلۡأَدۡبَٰرَ ثُمَّ لَا يُنصَرُونَ ﴿١٢﴾
لَأَنتُمۡ أَشَدُّ رَهۡبَةٗ فِي صُدُورِهِم مِّنَ ٱللَّهِۚ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمۡ قَوۡمٞ
لَّا يَفۡقَهُونَ ﴿١٣﴾ لَا يُقَٰتِلُونَكُمۡ جَمِيعًا إِلَّا فِي قُرٗى
مُّحَصَّنَةٍ أَوۡ مِن وَرَآءِ جُدُرِۭۚ بَأۡسُهُم بَيۡنَهُمۡ شَدِيدٞۚ تَحۡسَبُهُمۡ
جَمِيعٗا وَقُلُوبُهُمۡ شَتَّىٰۚ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمۡ قَوۡمٞ لَّا يَعۡقِلُونَ ﴿١٤﴾
كَمَثَلِ ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِهِمۡ قَرِيبٗاۖ ذَاقُواْ وَبَالَ أَمۡرِهِمۡ وَلَهُمۡ عَذَابٌ
أَلِيمٞ ﴿١٥﴾ كَمَثَلِ ٱلشَّيۡطَٰنِ إِذۡ قَالَ لِلۡإِنسَٰنِ ٱكۡفُرۡ فَلَمَّا كَفَرَ
قَالَ إِنِّي بَرِيٓءٞ مِّنكَ إِنِّيٓ أَخَافُ ٱللَّهَ رَبَّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴿١٦﴾

(١٠) ئەوانەش کە بەشوێن کۆچبەران و پشتیوانانا هاتن (تا کۆتایی دنیا ئەمە دۆعا و نزایانە و بەردەوام) دەڵێن: پەروەردگارا لە ئێمە و لەو برایانەشمان خۆش ببە کە پێش ئێمە ڕێبازی ئیمانیان گرتەبەر و لە دڵەکانماندا هیچ جۆرە بوغزو کینەیەک مەخەرە دڵمانەوە لە ئاستی ئەوانەی ئیمانیان هێناوە، پەروەردگارا تۆ بە راستی بەسۆزو بەخشندە و میهرەبانیت.

(١١) ئایا سەرنجت نەداوە لەوانەی کە دووڕوو بوون و بەبرا بێباوەڕەکانیان لە خاوەن کتێب دەڵێن: ئەگەر ئێوە دەربکرێن ئێمەش لەگەڵتاندا دەردەچین، هەرگیز دژی ئێوە بەقسەی کەس ناکەین، خۆ ئەگەر جەنگتان دژ بکرێت ئێمە پشتیوانیتان لێ دەکەین، بەمەرجێک؛ خوا خۆی شایەتە کە ئەوانە بێگومان درۆزنن.

(١٢) سوێند بەخوا ئەگەر دەربکرێن لەگەڵیاندا دەرناچن و ئەگەر جەنگیان دژبکرێت، پشتیوانییان لێناکەن و ئەگەر پشتیوانیشیان لێکردن، دوای تاوێک پشت هەڵدەکەن و پاشان سەرکەوتوو نابن.

(١٣) بەڕاستی ئێوەی ئیماندار ترستان زیاترە لە دڵ و دەروونیاندا تا خوای گەورە، چونکە بێگومان ئەوانە کەسانێکی ناحاڵی و تێ نەگەیشتوون (هەمیشە لە دڵەڕاوکێدان).

(١٤) هۆزی جولەکە هەرگیز بەیەک پارچەیی ناوێرن دژی ئێوە بجەنگن، مەگەرلە شوێنی قایم و قەڵای سەختدا، یان لە پشتی دیواری بەرزو قایمەوە، چونکە ئەو جووانە نێوانیان زۆر ناخۆشە و چارەی یەکتریان ناوێت، هەرچەندە وا دەزانیت یەکپارچەن، بەڵام لەراستیدا دڵەکانیان دوورن لە یەکەوە، چونکە ئەوانە ژیر و هۆشمەند نین.

(١٥) نموونەیان وەک نموونەی بێباوەڕانی ئەم نزیکانە وایە (کە لە جەنگی بەدردا) بەئەنجامی کارو کردەوەی خۆیان گەیشتن، لە قیامەتیشدا سزای بە ئێش و ئازار بۆیان ئامادەیە.

(١٦) (نێوانی دووڕووەکان لەگەڵ جووەکان) وەک شەیتان وایە کە هانی ئادەمیزاد دەدات لە ڕێی خەیاڵ و وەسوەسەوە؛ پێی دەڵێت : وەرە کافربە (بە جوانکردنی هەموو جۆرە تاوانێک کە خوا پێی ناخۆشە)، جا کاتێک کە کافر بوو (واتە ئەو کارانەی ئەنجام دا کە شەیتان پێی رازیە) پێی دەڵێت: بەراستی من بەریم لە تۆ من لە پەروەردگاری جیهانیان دەترسم!!.

فَكَانَ عَٰقِبَتَهُمَآ أَنَّهُمَا فِي ٱلنَّارِ خَٰلِدَيْنِ فِيهَاۚ وَذَٰلِكَ جَزَٰٓؤُاْ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿١٧﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَلْتَنظُرْ نَفْسٌ مَّا قَدَّمَتْ لِغَدٍۖ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَۚ إِنَّ ٱللَّهَ خَبِيرُۢ بِمَا تَعْمَلُونَ ﴿١٨﴾ وَلَا تَكُونُواْ كَٱلَّذِينَ نَسُواْ ٱللَّهَ فَأَنسَىٰهُمْ أَنفُسَهُمْۚ أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْفَٰسِقُونَ ﴿١٩﴾ لَا يَسْتَوِيٓ أَصْحَٰبُ ٱلنَّارِ وَأَصْحَٰبُ ٱلْجَنَّةِۚ أَصْحَٰبُ ٱلْجَنَّةِ هُمُ ٱلْفَآئِزُونَ ﴿٢٠﴾ لَوْ أَنزَلْنَا هَٰذَا ٱلْقُرْءَانَ عَلَىٰ جَبَلٍ لَّرَأَيْتَهُۥ خَٰشِعًا مُّتَصَدِّعًا مِّنْ خَشْيَةِ ٱللَّهِۚ وَتِلْكَ ٱلْأَمْثَٰلُ نَضْرِبُهَا لِلنَّاسِ لَعَلَّهُمْ يَتَفَكَّرُونَ ﴿٢١﴾ هُوَ ٱللَّهُ ٱلَّذِي لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَۖ عَٰلِمُ ٱلْغَيْبِ وَٱلشَّهَٰدَةِۖ هُوَ ٱلرَّحْمَٰنُ ٱلرَّحِيمُ ﴿٢٢﴾ هُوَ ٱللَّهُ ٱلَّذِي لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ٱلْمَلِكُ ٱلْقُدُّوسُ ٱلسَّلَٰمُ ٱلْمُؤْمِنُ ٱلْمُهَيْمِنُ ٱلْعَزِيزُ ٱلْجَبَّارُ ٱلْمُتَكَبِّرُۚ سُبْحَٰنَ ٱللَّهِ عَمَّا يُشْرِكُونَ ﴿٢٣﴾ هُوَ ٱللَّهُ ٱلْخَٰلِقُ ٱلْبَارِئُ ٱلْمُصَوِّرُۖ لَهُ ٱلْأَسْمَآءُ ٱلْحُسْنَىٰۚ يُسَبِّحُ لَهُۥ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِۖ وَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ ﴿٢٤﴾

سُورَةُ المُمْتَحَنَة

(١٧) سەرئەنجامی هەردووکیان (شەیتان و ئادەمیزادی کافر) ئەوەیە کە هەردوو لە دۆزەخدا بۆ هەمیشە، بەنەمریی دەمێننەوە، ئەوەش پاداشتی ستەمکارانە.

(١٨) ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە، خواناس و پارێزکاربن و لە سنوورەکانی مەترازێن، با هەموو کەسێک سەرنج بدات و بزانێت چی بۆ سبەی دەست پێشکەری کردووە، هەوڵ بدەن هەمیشەو بەردەوام پارێزکارو دیندارو خواناس بن، چونکە بەڕاستی خوا زۆر ئاگایە بەهەموو ئەو کاروکردەوانەی کە ئەنجامی دەدەن.

(١٩) نەکەن وەکو ئەوکەسانە بن کە خوایان فەرامۆش کرد، شوێنی بەرنامەکەی نەکەوتن، خوایش ئەوانی لە بیر خۆیان بردەوە، ئەوانە لە سنوور دەرچوو تاوانبارەکانن.

(٢٠) (بێگومان) نیشتەجێکانی دۆزەخ وەک بەهەشتیەکان نین، چونکە هەر بەهەشتیەکان سەرفرازو کامەران و بەختەوەرن.

(٢١) ئەگەر ئەم قورئانەمان دابەزاندایە سەر کەژو کێوێک، دەتبینی ملکەچ دەبوو، ورد و خاش دەبوو، شەق و پەق دەبوو، لە ترسی فەرمانی خوا، لە هەیبەتی گەورەیی و دەسەڵاتی خوا، ئێمە ئەم نموونانە دەهێنینەوە بۆ خەڵکی بۆ ئەوەی بیربکەنەوە و ژیرییان بخەنە کار و شوێن قورئانی پیرۆز بکەون.

(٢٢) خوا ئەو زاتەیە کە جگە لەو خوایەکی تر نیە زانایە بە هەموو نهێنی و ئاشکراکان، ئەو خوایە بەخشندە و میهرەبان و دلۆڤانە کانگای رەحم و بەزەییە.

(٢٣) خوا ئەوزاتەیە کە جگە لەو خوایەکی تر نیە پاشای هەموو بوونەوەرە، پاک و بێگەردو پوختە، ئاشتی خواز و ئاشتی پەروەرە، ئاسایش بەخش و پەناگای ئیماندارانە، دەسەڵاتدارە و چاودێری دروستکراوەکانیەتی، باڵادەستە، خاوەنی خێری بێسنوورە، گەورەیە و خۆی بەگەورە دەزانێت، پاکی و بێگەردی بۆ ئەو خوایەیە لەوەی تێ نەگەیشتوان شەریک و هاوەڵی بۆ بڕیار دەدەن.

(٢٤) هەر ئەو خوایە بەدیهێنەرو دروستکارە، (لە نەبوون هەرچی بوێ بەدی دەهێنێت)، نەخشە و وێنە کێشەرە، ناوە پیرۆزو جوانەکان، هەمووی شایستەی ئەون، هەرچی لە ئاسمانەکان و زەویدا هەیە ستایشی ئەو دەکەن، بەڕاستی ئەو زاتە خوایەکی باڵادەست و دانایە.

سوورەتی (الممتحنة)

بەناوی خوای بەخشندە و میهرەبان

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تَتَّخِذُوا عَدُوِّي وَعَدُوَّكُمْ أَوْلِيَاءَ تُلْقُونَ إِلَيْهِمْ بِالْمَوَدَّةِ وَقَدْ كَفَرُوا بِمَا جَاءَكُمْ مِنَ الْحَقِّ يُخْرِجُونَ الرَّسُولَ وَإِيَّاكُمْ أَنْ تُؤْمِنُوا بِاللَّهِ رَبِّكُمْ إِنْ كُنْتُمْ خَرَجْتُمْ جِهَادًا فِي سَبِيلِي وَابْتِغَاءَ مَرْضَاتِي تُسِرُّونَ إِلَيْهِمْ بِالْمَوَدَّةِ وَأَنَا أَعْلَمُ بِمَا أَخْفَيْتُمْ وَمَا أَعْلَنْتُمْ وَمَنْ يَفْعَلْهُ مِنْكُمْ فَقَدْ ضَلَّ سَوَاءَ السَّبِيلِ ﴿١﴾ إِنْ يَثْقَفُوكُمْ يَكُونُوا لَكُمْ أَعْدَاءً وَيَبْسُطُوا إِلَيْكُمْ أَيْدِيَهُمْ وَأَلْسِنَتَهُمْ بِالسُّوءِ وَوَدُّوا لَوْ تَكْفُرُونَ ﴿٢﴾ لَنْ تَنْفَعَكُمْ أَرْحَامُكُمْ وَلَا أَوْلَادُكُمْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ يَفْصِلُ بَيْنَكُمْ وَاللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ ﴿٣﴾ قَدْ كَانَتْ لَكُمْ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ فِي إِبْرَاهِيمَ وَالَّذِينَ مَعَهُ إِذْ قَالُوا لِقَوْمِهِمْ إِنَّا بُرَآءُ مِنْكُمْ وَمِمَّا تَعْبُدُونَ مِنْ دُونِ اللَّهِ كَفَرْنَا بِكُمْ وَبَدَا بَيْنَنَا وَبَيْنَكُمُ الْعَدَاوَةُ وَالْبَغْضَاءُ أَبَدًا حَتَّىٰ تُؤْمِنُوا بِاللَّهِ وَحْدَهُ إِلَّا قَوْلَ إِبْرَاهِيمَ لِأَبِيهِ لَأَسْتَغْفِرَنَّ لَكَ وَمَا أَمْلِكُ لَكَ مِنَ اللَّهِ مِنْ شَيْءٍ رَبَّنَا عَلَيْكَ تَوَكَّلْنَا وَإِلَيْكَ أَنَبْنَا وَإِلَيْكَ الْمَصِيرُ ﴿٤﴾ رَبَّنَا لَا تَجْعَلْنَا فِتْنَةً لِلَّذِينَ كَفَرُوا وَاغْفِرْ لَنَا رَبَّنَا إِنَّكَ أَنْتَ الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ ﴿٥﴾

(١) ئەی ئەو کەسانەی باوەڕتان هێناوە دوژمنانی من و دوژمنانی خۆتان مەکەنە دۆستی گیانی بەگیانی، لەکاتێکدا خۆشەویستی و سۆزی خۆتانیان بۆ دەردەبرن، بەڕاستی ئەوان بێباوەڕیش بوون بەوەی لە لایەن خواوە بۆتان هاتووە، ئەوانە پێغەمبەرو ئێوەش دەردەکەن لە مەککە، لەبەر ئەوەی کە باوەڕ دەهێنن بەخوای پەروەردگارتان، (ئەمەم بەگوێ بکەن) ئەگەر ئێوە دەرچوون بۆ تێکۆشان لە پێناوی من و بەدەستهێنانی ڕەزامەندی مندا، بەنهێنی خۆشەویستی خۆتانیان پێدەگەیەنن، لەکاتێکدا من ئاگادارم بەوەی شاردوتانەتەوە و بەوەش کە ئاشکراتان کردووە، جا هەر کەس لە ئێوە کاری وابکات ئەوە بەڕاستی ڕێبازی ڕاستی ون کردووە.

(٢) هەر کاتێک خوانەناسان دەسەڵاتیان هەبێت و ئێوەیان دەست بکەوێت، ئەوە دەبنە دوژمنتان و دەست و زمانیان بەخراپە درێژ دەکەن بۆتان (بەهەرچی بۆیان بکرێت) ئەوانە پێیان خۆش بووە و ئاواتیان خواستووە کە ئێوە لە ئایینەکەتان هەڵگەڕێنەوە.

(٣) خزمان و ڕۆڵەکانتان هەرگیز فریاتان ناکەون، چونکە لە ڕۆژی قیامەتدا لە یەکتان جیادەکاتەوە، بەڕاستی خوا بینایە بەو کارو کردەوەی کە دەیکەن.

(٤) ئەی ئیمانداران، بەڕاستی لە ئیبراهیم و ئەوانەی کە لەگەڵیدا بوون نموونەیەکی چاکتان خراوەتە بەرچاو، کاتێک کە بە قەومەکەی خۆیانیان وت: دوای ساڵەها بانگەواز، ئێمە بەرین لە ئێوە و لەو شتانەش کە لەجیاتی خوا دەیپەرستن، ئێمە باوەڕمان بەو دین و ئاینەی ئێوە نیە، نیتر دوژمنایەتی و ڕقەبەرایەتی لەنێوانماندا بەرپا بووە تا ئەو کاتەی کە باوەڕ بە خوای تاک و تەنها دەهێنن، جگە لەو بەڵێنەی ئیبراهیم دای بە باوکی و وتی: بێگومان داوای لێخۆشبوونت بۆ دەکەم، دەسەڵاتی خوایشم نیە ئەگەر کارەساتێکت بەسەر بهێنێت، ئینجا وتی: پەروەردگارا، هەر پشتمان بە تۆ بەستووە و هەر بۆ لای تۆش گەڕاوینەتەوە، سەرەنجامیش هەر بۆ لای تۆیە.

(٥) پەروەردگارا مەمانکە بەمایەی گومڕایی بۆ ئەوانەی بێ باوەڕ بوون، لێشمان خۆش ببە پەروەردگارمان، بەڕاستی هەر تۆ خوایەکی باڵادەست و دانایت.



لَقَدْ كَانَ لَكُمْ فِيهِمْ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ لِّمَن كَانَ يَرْجُو اللَّهَ وَالْيَوْمَ الْآخِرَ ۚ وَمَن يَتَوَلَّ فَإِنَّ اللَّهَ هُوَ الْغَنِيُّ الْحَمِيدُ ﴿٦﴾ عَسَى اللَّهُ أَن يَجْعَلَ بَيْنَكُمْ وَبَيْنَ الَّذِينَ عَادَيْتُم مِّنْهُم مَّوَدَّةً ۚ وَاللَّهُ قَدِيرٌ ۚ وَاللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿٧﴾ لَّا يَنْهَاكُمُ اللَّهُ عَنِ الَّذِينَ لَمْ يُقَاتِلُوكُمْ فِي الدِّينِ وَلَمْ يُخْرِجُوكُم مِّن دِيَارِكُمْ أَن تَبَرُّوهُمْ وَتُقْسِطُوا إِلَيْهِمْ ۚ إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ الْمُقْسِطِينَ ﴿٨﴾ إِنَّمَا يَنْهَاكُمُ اللَّهُ عَنِ الَّذِينَ قَاتَلُوكُمْ فِي الدِّينِ وَأَخْرَجُوكُم مِّن دِيَارِكُمْ وَظَاهَرُوا عَلَىٰ إِخْرَاجِكُمْ أَن تَوَلَّوْهُمْ ۚ وَمَن يَتَوَلَّهُمْ فَأُولَٰئِكَ هُمُ الظَّالِمُونَ ﴿٩﴾ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِذَا جَاءَكُمُ الْمُؤْمِنَاتُ مُهَاجِرَاتٍ فَامْتَحِنُوهُنَّ ۖ اللَّهُ أَعْلَمُ بِإِيمَانِهِنَّ ۖ فَإِنْ عَلِمْتُمُوهُنَّ مُؤْمِنَاتٍ فَلَا تَرْجِعُوهُنَّ إِلَى الْكُفَّارِ ۖ لَا هُنَّ حِلٌّ لَّهُمْ وَلَا هُمْ يَحِلُّونَ لَهُنَّ ۖ وَآتُوهُم مَّا أَنفَقُوا ۚ وَلَا جُنَاحَ عَلَيْكُمْ أَن تَنكِحُوهُنَّ إِذَا آتَيْتُمُوهُنَّ أُجُورَهُنَّ ۚ وَلَا تُمْسِكُوا بِعِصَمِ الْكَوَافِرِ وَاسْأَلُوا مَا أَنفَقْتُمْ وَلْيَسْأَلُوا مَا أَنفَقُوا ۚ ذَٰلِكُمْ حُكْمُ اللَّهِ ۖ يَحْكُمُ بَيْنَكُمْ ۚ وَاللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ ﴿١٠﴾ وَإِن فَاتَكُمْ شَيْءٌ مِّنْ أَزْوَاجِكُمْ إِلَى الْكُفَّارِ فَعَاقَبْتُمْ فَآتُوا الَّذِينَ ذَهَبَتْ أَزْوَاجُهُم مِّثْلَ مَا أَنفَقُوا ۚ وَاتَّقُوا اللَّهَ الَّذِي أَنتُم بِهِ مُؤْمِنُونَ ﴿١١﴾

(٦) سوێند بەخوا بەراستی لە سەرگوزەشتە و ژیانی ئیبراهیم و ئەواندا نموونە و پێشەنگێکی چاک هەیە بۆ ئەوەی چاویان لیّ بکەن، بۆ ئەو کەسەی کە ئاوات و ئومێدی ڕەزامەندی خوایەو لە ڕۆژی دوایی دەترسێت و حسابی بۆ دەکات، جا ئەوەش کە پشت هەڵدەکات و شوێن ڕێبازی ئەوان ناکەوێت ئەوە بابزانێت خۆی زەرەر دەکات چونکە خوا هەر خۆی بێنیازە و شایستەی هەموو جۆرە سوپاسێکە.

(٧) نزیکە خوا خۆشەویستی و سۆز بەرپا بکات لە نێوان ئێوە و ئەوانەدا کە دوژمنایەتیتان لەگەڵ کردن لەوان و هەندێکیان باوەڕ بهێنن، هەمیشە خوا بە دەسەڵاتە، هەر ئەو خوایەش لێخۆشبوو میهرەبانە چاوپۆشی لە رابوردوو دەکات.

(٨) دڵنیاش بن کە خوا قەدەغەی ئەوەتان لیّ ناکات کە چاک ڕەفتاری و دادپەروەری بکەن لەگەڵ ئەو کەسانەدا جەنگیان دژ نەکردون و دژایەتی ئاینیان نەکردون و لە شوێنەوارتان دەریان نەکردون، چونکە بەراستی خوا دادپەروەرانی خۆش دەوێت.

(٩) بەراستی خوا تەنها قەدەغەی ئەوەتان لیّ دەکات کە پشتیوانیی بکەن لەوانەی کە جەنگیان بەرپا کرد دژی ئاین و دەریان کردن لە شوێنەواری خۆتان و پشتیوانی ئەوانیان کرد ڕۆڵیان هەبوو لە دەرکردنتاندا، ئەوەش پشتیوانیان لیّ بکات و خۆشی بوێن، جا ئائەوانە هەر ستەمکارن.

(١٠) ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە کاتێک ئافرەتە ئیماندارەکان کۆچ دەکەن و دێن بۆ لاتان تاقیان بکەنەوەو بەوردیی پرسیاریان لیّ بکەن سەبارەت بەکۆچ و هۆی هاتنەکەیان، خوا ئاگادارە بە ئیمانەکەیان، جا ئەگەر زانیتان باوەڕدارن، ئەوە مەیانگێڕنەوە بۆ لای مێردە بێ باوەڕەکانیان، نە ئەم ئافرەتانە حەڵاڵی ئەو بێ باوەڕانەن، نەئەو بێ باوەڕانەش حەڵاڵن بۆ ئەم ئافرەتە ئیماندارانە، ئەو مارەییەی مێردە کافرەکانیان خەرجیان کردووە بۆیان بگێڕنەوە، ئیتر هیچ ڕەخنەیەکیش لەسەرتان نییە ئەو ئافرەتانە مارە بکەن کاتێک مارەییان بدەنێ، ئافرەتانی کافرمەهێڵنەوە لای خۆتان، واتە مارەیان مەکەن، ئێوەش ئەی ئیمانداران ئەگەر مەسرەفێکتان کردووە لە ئافرەتێکی کافردا داوای بکەنەوە، ئەوانیش ئەگەر مەسرەفێکیان کردووە لە ئافرەتێکی ئیمانداردا با داوای بکەنەوە، ئائەوە حوکم و فەرمانی خوایە، کە خۆی فەرمانڕەوایی دەکات لە نێوانتاندا، خوای گەورەش هەمیشە زانا و دانایە.

(١١) خۆ ئەگەر یەکێک یان هەندێک لە هاوسەرانتان گەڕانەوە بۆ ناو کافران، لەوەودوا جەنگ لەنێوان ئێوە و کافراندا بەرپابوو و سەرکەوتن بەسەریاندا، ئێوە لە دەستکەوتی ئەو جەنگە زەرەری ئەو ئیماندارانە ببژێرن کە خێزانەکانیان ڕۆشتوون، لەو خوایە بترسن کە ئێوە هەمیشە بڕوادارن پێی.

يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ إِذَا جَآءَكَ ٱلْمُؤْمِنَٰتُ يُبَايِعْنَكَ عَلَىٰٓ أَن لَّا يُشْرِكْنَ بِٱللَّهِ شَيْـًٔا وَلَا يَسْرِقْنَ وَلَا يَزْنِينَ وَلَا يَقْتُلْنَ أَوْلَٰدَهُنَّ وَلَا يَأْتِينَ بِبُهْتَٰنٍ يَفْتَرِينَهُۥ بَيْنَ أَيْدِيهِنَّ وَأَرْجُلِهِنَّ وَلَا يَعْصِينَكَ فِى مَعْرُوفٍ فَبَايِعْهُنَّ وَٱسْتَغْفِرْ لَهُنَّ ٱللَّهَ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿١٢﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَا تَتَوَلَّوْا۟ قَوْمًا غَضِبَ ٱللَّهُ عَلَيْهِمْ قَدْ يَئِسُوا۟ مِنَ ٱلْءَاخِرَةِ كَمَا يَئِسَ ٱلْكُفَّارُ مِنْ أَصْحَٰبِ ٱلْقُبُورِ ﴿١٣﴾

سُورَةُ الصَّفِّ

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

سَبَّحَ لِلَّهِ مَا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِى ٱلْأَرْضِ وَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ ﴿١﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لِمَ تَقُولُونَ مَا لَا تَفْعَلُونَ ﴿٢﴾ كَبُرَ مَقْتًا عِندَ ٱللَّهِ أَن تَقُولُوا۟ مَا لَا تَفْعَلُونَ ﴿٣﴾ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلَّذِينَ يُقَٰتِلُونَ فِى سَبِيلِهِۦ صَفًّا كَأَنَّهُم بُنْيَٰنٌ مَّرْصُوصٌ ﴿٤﴾ وَإِذْ قَالَ مُوسَىٰ لِقَوْمِهِۦ يَٰقَوْمِ لِمَ تُؤْذُونَنِى وَقَد تَّعْلَمُونَ أَنِّى رَسُولُ ٱللَّهِ إِلَيْكُمْ فَلَمَّا زَاغُوٓا۟ أَزَاغَ ٱللَّهُ قُلُوبَهُمْ وَٱللَّهُ لَا يَهْدِى ٱلْقَوْمَ ٱلْفَٰسِقِينَ ﴿٥﴾

(١٢) ئەی پێغەمبەر ﷺ کاتێک ئافرەتانی ئیماندار هاتن بۆ لات و پەیمانیان پێدایت کە: هیچ جۆرە هاوەڵێک بۆ خوا بڕیار نەدەن، دزی نەکەن، زینا نەکەن، ڕۆڵەکانی خۆیان نەکوژن، هیچ جۆرە بوختانێک نەکەن لەنێوان دەست و پێی خۆیاندا (واتە دوورە پەرێزبن لە هەموو جۆرە خیانەتێک) و فەرمانبەردارت بن لە هەموو چاکەیەکداو یاخی نەبن لێت، جا ئەوە تۆ پەیمانیان لەگەڵ ببەستە و لە خوا داوای لێ خۆشبوونیان بۆ بکە، چونکە بەڕاستی خوا لێخۆشبوو میهرەبانە.

(١٣) ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە پشت مەبەستن بەکەسانێک خوا خەشمی لێگرتوون و دۆستایەتیان مەکەن، بێگومان ئەوانە نائومێد و بێهیوا بوون لە پاداشتی قیامەت، هەروەکو کافران، نائومێد بوون لە گەڕانەوەی نیشتەجێکانی گۆڕستان .

سوورەتی (الــصـــف)

بەناوی خوای بەخشندە و میهرەبان

(١) هەرچی لە ئاسمانەکان و زەویدا هەیە بە پاکی و بێگەردی یادی خوایان کردووە، هەر ئەویش باڵادەست و دانایە.

(٢) ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە بۆچی شتێک دەڵێن و ئەنجامی نادەن؟ بۆچی گوفتارتان دژی کردارتانە؟!

(٣) خەشم و رقێکی گەورەیە لای خوا ئەوەی کە دەیڵێن و نایکەن.

(٤) بەڕاستی خوا ئەو کەسانەی خۆش دەوێت کە دەجەنگن لەپێناو ڕێبازی خوادا بەیەک ڕیزو یەک پارچە و یەک دڵ، چونکە هەروەک کۆشکێکی بەرزی قایمی داڕێژراون بە قوڕقوشم.

(٥) بیریان بخەرەوە، کاتێک کە موسا بە قەومەکەی وت: ئەی قەوم و هۆزم ئێوە بۆچی ئازاری ڕۆح و دڵم دەدەن ، لەکاتێکدا بێگومان دەزانن کە من پێغەمبەر و ڕەوانەکراوی خوام بۆتان، جا کاتێک ئەوان گوێیان بۆ ڕاستی نەگرت و لەحەق لایاندا، خوایش دڵەکانیانی لەخشتە بردو مۆری پێدا نا، چونکە خوا ڕێنموویی قەوم و هۆزی تاوانکارو تاوانبارو لەسنوور دەرچوو ناکات.

وَإِذْ قَالَ عِيسَى ٱبْنُ مَرْيَمَ يَٰبَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ إِنِّى رَسُولُ ٱللَّهِ إِلَيْكُم مُّصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ يَدَىَّ مِنَ ٱلتَّوْرَىٰةِ وَمُبَشِّرًۢا بِرَسُولٍ يَأْتِى مِنۢ بَعْدِى ٱسْمُهُۥٓ أَحْمَدُ ۖ فَلَمَّا جَآءَهُم بِٱلْبَيِّنَٰتِ قَالُوا۟ هَٰذَا سِحْرٌ مُّبِينٌ ﴿٦﴾ وَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّنِ ٱفْتَرَىٰ عَلَى ٱللَّهِ ٱلْكَذِبَ وَهُوَ يُدْعَىٰٓ إِلَى ٱلْإِسْلَٰمِ ۚ وَٱللَّهُ لَا يَهْدِى ٱلْقَوْمَ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٧﴾ يُرِيدُونَ لِيُطْفِـُٔوا۟ نُورَ ٱللَّهِ بِأَفْوَٰهِهِمْ وَٱللَّهُ مُتِمُّ نُورِهِۦ وَلَوْ كَرِهَ ٱلْكَٰفِرُونَ ﴿٨﴾ هُوَ ٱلَّذِىٓ أَرْسَلَ رَسُولَهُۥ بِٱلْهُدَىٰ وَدِينِ ٱلْحَقِّ لِيُظْهِرَهُۥ عَلَى ٱلدِّينِ كُلِّهِۦ وَلَوْ كَرِهَ ٱلْمُشْرِكُونَ ﴿٩﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ هَلْ أَدُلُّكُمْ عَلَىٰ تِجَٰرَةٍ تُنجِيكُم مِّنْ عَذَابٍ أَلِيمٍ ﴿١٠﴾ تُؤْمِنُونَ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ وَتُجَٰهِدُونَ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ بِأَمْوَٰلِكُمْ وَأَنفُسِكُمْ ۚ ذَٰلِكُمْ خَيْرٌ لَّكُمْ إِن كُنتُمْ تَعْلَمُونَ ﴿١١﴾ يَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ وَيُدْخِلْكُمْ جَنَّٰتٍ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ وَمَسَٰكِنَ طَيِّبَةً فِى جَنَّٰتِ عَدْنٍ ۚ ذَٰلِكَ ٱلْفَوْزُ ٱلْعَظِيمُ ﴿١٢﴾ وَأُخْرَىٰ تُحِبُّونَهَا ۖ نَصْرٌ مِّنَ ٱللَّهِ وَفَتْحٌ قَرِيبٌ ۗ وَبَشِّرِ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴿١٣﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ كُونُوٓا۟ أَنصَارَ ٱللَّهِ كَمَا قَالَ عِيسَى ٱبْنُ مَرْيَمَ لِلْحَوَارِيِّۦنَ مَنْ أَنصَارِىٓ إِلَى ٱللَّهِ ۖ قَالَ ٱلْحَوَارِيُّونَ نَحْنُ أَنصَارُ ٱللَّهِ ۖ فَـَٔامَنَت طَّآئِفَةٌ مِّنۢ بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ وَكَفَرَت طَّآئِفَةٌ ۖ فَأَيَّدْنَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ عَلَىٰ عَدُوِّهِمْ فَأَصْبَحُوا۟ ظَٰهِرِينَ ﴿١٤﴾

(٦) بیریان بخەرەوە، کاتێک عیسای کوڕی مەریەم بەنەوەی ئیسرائیلی وت: منیش بەڕاستی پێغەمبەری خوام بۆ سەر ئێوە، ڕاستی تەوراتیش دەسەلمێنم کەلە پێش مندا هاتووە، هەروەها مژدەدەریشم بەپێغەمبەرێک کە دوای من دێت و ناوی ـ ئەحمەد ـ ە، کەچی کاتێک بە بەڵگە و نیشانەی تێرو تەواوو موعجیزەی ئاشکراوە پێی ڕاگەیاندن، وتیان: ئەمە جادوویەکی ئاشکرایە.

(٧) جا کێ لەو کەسە ستەمکارترە کە درۆی بۆ خوا هەڵبەستووە، لەکاتێکدا ئەو بانگ دەکرێت بۆ لای ئیسلام و موسڵمان بوون، خوایش هیدایەت و ڕێنمووییی قەومی ستەمکار ناکات.

(٨) ئەوانە دەیانەوێت بەفوو، بەقاڵەی دەم، نووری خوا بکوژێننەوە!! (خەیاڵیان خاوە) خوا نووری خۆی، ئایینی خۆی، تەواو دەکات و دەیچەسپێنێت هەرچەندە کافرو بێبڕواکان پێی سەغڵەت بن و پێیان ناخۆش بێت.

(٩) هەر ئەو خوایە پێغەمبەرەکەی خۆی ڕەوانە کردووە هاوڕێ لەگەڵ هیدایەت و ڕێنمووییی وئایینی حەق و ڕاستیدا، تا سەری بخات بەسەر هەموو ئاین و بەرنامەکاندا، هەرچەندە موشریک و هاوەڵگەران پێیان ناخۆش بێت.

(١٠) ئەی ئەو کەسانەی باوەڕتان هێناوە، دەستنیشانی بازرگانیەکتان بۆ بکەم، کە لە سزایەکی بە ئێش ڕزگارتان بکات؟!

(١١) سەرەتا باوەڕهێنانتانە بە خواو پێغەمبەرەکەی، ئینجا هەوڵ و تێکۆشانتانە لەڕێگەی خوادا بە بەخشینی ماڵ و سامانتان، وە بەخشینی خۆتان (واتە: ماندووکردنی جەستە و بیروهۆشتان، تا بەخت کردنیان لەپێناوی خوادا) بێگومان ئەو کارەتان چاکتر و بەفەڕترە بۆتان ئەگەر بزانن و تێبگەن.

(١٢) ئەوسا خوا لە گوناهو هەڵەکانتان خۆش دەبێت و دەتانخاتە باخەکانی بەهەشتەوە کە چەندەها ڕووبار بەژێر درەختەکانیدا تێ دەپەڕێت و جاریە، هەروەها کۆشک و تەلاری خۆش و ڕازاوە و پاک و خاوێن لە باخەکانی بەهەشتی عەدندا، بەڕاستی ئا ئەوەیە سەرکەوتن و سەرفرازی و دەستکەوتی گەورە و بێسنوور.

(١٣) جا شتێکی تریش هەیە کە حەزی لێ دەکەن، ئەویش بەخشینی سەرکەوتنە لەلایەن خواوە و کردنەوەی وڵاتان و دڵەکانە، ئەو مژدەیەش بدە بە ئیمانداران (لە هەموو سەردەمێکدا، گەر ئیمانداران لێ ببڕێن بۆ ئایینی خوای مەزن).

(١٤) ئەی ئەو کەسانەی کە ئیمان و باوەڕتان هێناوە ببنە پشتیوانی بەرنامە و دینی خوا ببینە لایەنگری پەروەردگار، هەروەکو عیسای کوڕی مەریەم بە حەواریەکانی هاوەڵی وت: کێ پشتیوان و یارو یاوەرمە بۆ ڕێبازی خوا، حەواری و هاوەڵەکانی وتیان: ئێمە ئامادەین ببینە پشتیوان و لایەنگری خوا، ئەوسا ئیتر خەڵکی بوون بە دوو دەستەوە، دەستەیەک لە نەوەی ئیسرائیل باوەڕی هێناو شوێن بەرنامەی خوا کەوت، دەستەیەکیش ڕێبازی کوفری گرتەبەر، جا ئێمەش پشتیوانیمان لە ئیمانداران کردو بەو هۆیەوە سەرکەوتنمان بەسەر دوژمنەکانیاندا پێبەخشین و زاڵ بوون.



سورة الجمعة

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

يُسَبِّحُ لِلَّهِ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلۡأَرۡضِ ٱلۡمَلِكِ ٱلۡقُدُّوسِ ٱلۡعَزِيزِ ٱلۡحَكِيمِ ﴿١﴾ هُوَ ٱلَّذِي بَعَثَ فِي ٱلۡأُمِّيِّـۧنَ رَسُولٗا مِّنۡهُمۡ يَتۡلُواْ عَلَيۡهِمۡ ءَايَٰتِهِۦ وَيُزَكِّيهِمۡ وَيُعَلِّمُهُمُ ٱلۡكِتَٰبَ وَٱلۡحِكۡمَةَ وَإِن كَانُواْ مِن قَبۡلُ لَفِي ضَلَٰلٖ مُّبِينٖ ﴿٢﴾ وَءَاخَرِينَ مِنۡهُمۡ لَمَّا يَلۡحَقُواْ بِهِمۡۚ وَهُوَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡحَكِيمُ ﴿٣﴾ ذَٰلِكَ فَضۡلُ ٱللَّهِ يُؤۡتِيهِ مَن يَشَآءُۚ وَٱللَّهُ ذُو ٱلۡفَضۡلِ ٱلۡعَظِيمِ ﴿٤﴾ مَثَلُ ٱلَّذِينَ حُمِّلُواْ ٱلتَّوۡرَىٰةَ ثُمَّ لَمۡ يَحۡمِلُوهَا كَمَثَلِ ٱلۡحِمَارِ يَحۡمِلُ أَسۡفَارَۢاۚ بِئۡسَ مَثَلُ ٱلۡقَوۡمِ ٱلَّذِينَ كَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِۚ وَٱللَّهُ لَا يَهۡدِي ٱلۡقَوۡمَ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٥﴾ قُلۡ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ هَادُوٓاْ إِن زَعَمۡتُمۡ أَنَّكُمۡ أَوۡلِيَآءُ لِلَّهِ مِن دُونِ ٱلنَّاسِ فَتَمَنَّوُاْ ٱلۡمَوۡتَ إِن كُنتُمۡ صَٰدِقِينَ ﴿٦﴾ وَلَا يَتَمَنَّوۡنَهُۥٓ أَبَدَۢا بِمَا قَدَّمَتۡ أَيۡدِيهِمۡۚ وَٱللَّهُ عَلِيمُۢ بِٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٧﴾ قُلۡ إِنَّ ٱلۡمَوۡتَ ٱلَّذِي تَفِرُّونَ مِنۡهُ فَإِنَّهُۥ مُلَٰقِيكُمۡۖ ثُمَّ تُرَدُّونَ إِلَىٰ عَٰلِمِ ٱلۡغَيۡبِ وَٱلشَّهَٰدَةِ فَيُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمۡ تَعۡمَلُونَ ﴿٨﴾

## سوورەتی (الجمعة)

بەناوی خوای بەخشندە و میهرەبان

(١) هەرچی لە ئاسمانەکان و هەرچی لە زەویدا هەیە تەسبیحات و ستایشی خوا دەکەن.. ئەو خوایەی کە پاشایە و شاهی شاهانە، پاک و بێگەردو پوختە، بالادەست و دانایە..

(٢) هەر ئەو زاتەیە لەناو خەڵکێکی نەخوێندەواردا پێغەمبەرێکی لە خۆیان ڕەوانە کرد، ئایەتەکانی قورئانەکەی ئەویان بەسەردا دەخوێنێتەوە و دڵ و دەروون و ڕواڵەت و ئاشکرا و نادیاریان پوختە دەکات، فێری قورئان و دانایی و شەریعەتیان دەکات، بەڕاستی ئەوانە پێشتر لەگومرایی و سەرلێشێواویەکی ئاشکرادا گیریان خواردبوو.

(٣) لەئایندەدا خەڵکی تریش دێن (موسڵمان دەبن لە گەل و میللەتان) پەیوەست دەبن بەمانەوە، بێگومان ئەو زاتە بالادەست و دانا و کار دروستە.

(٤) ئەوە ڕێزو بەهرەیەکی خوایییە دەیبەخشێت بەو کەسەی کە خوا خۆی ئارەزووی بکات و شایستە بێت، خوایش خاوەنی بەخشش و بەهرەی گەورە و بێسنوورە.

(٥) وێنەی ئەوانەی کە تەوراتیان درا بەسەردا تا پەیڕەوی بکەن، پاشان هەڵیان نەگرت و پەیڕەویان نەکرد، وەک: گوێدرێژێک وایە کە بارە کتێبێکی هەڵگرتبێت، ئای کە چەندە ناشیرینە وێنەو نموونەی ئەوانەی کە ئایەتەکانی خوایان بەدرۆ زانیووە و بڕوایان پێی نەبوو، بێگومان خوا هیدایەت و ڕێنموویی ستەمکاران ناکات.

(٦) ئەی پێغەمبەر ﷺ پێیان بڵێ: ئەی ئەوانەی لەسەر دینی جوولەکەن، ئەگەر ئێوە بڕواتان وایە کە بەڕاستی ئێوە دۆست و لایەنگری خوان، جگە لە خەڵکی تر، کەواتە داوای مردن بکەن و ئاواتی مەرگ بخوازن، (تا لە ژیانی پڕ مەینەتی دنیا ڕزگارتان ببێت و بە بەهەشت و دیداری پەروەردگار شاد ببن)!

(٧) کەچی ئەوانە هەرگیزاو هەرگیز ئاواتی وا ناخوازن و مردن داوا ناکەن، چونکە خۆیان دەزانن چیان دەست پێشکەری کردووە، خوایش زانایە بە کاروکردەوەی ستەمکاران.

(٨) پێیان بڵێ ئەی پێغەمبەر ﷺ: بەڕاستی ئەو مردنەی کە ڕادەکەن لە دەستی هەر یەخەتان پێ دەگرێت، لەوەودوایش دەگەڕێنرێنەوە بۆ لای کەسێک کە زانایە بەنهێنی و ئاشکرا، ئەوسا ئاگادارتان دەکات بەوەی کە دەتانکرد.

يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا نُودِيَ لِلصَّلَوٰةِ مِن يَوۡمِ ٱلۡجُمُعَةِ فَٱسۡعَوۡاْ إِلَىٰ ذِكۡرِ ٱللَّهِ وَذَرُواْ ٱلۡبَيۡعَۚ ذَٰلِكُمۡ خَيۡرٞ لَّكُمۡ إِن كُنتُمۡ تَعۡلَمُونَ ﴿٩﴾ فَإِذَا قُضِيَتِ ٱلصَّلَوٰةُ فَٱنتَشِرُواْ فِي ٱلۡأَرۡضِ وَٱبۡتَغُواْ مِن فَضۡلِ ٱللَّهِ وَٱذۡكُرُواْ ٱللَّهَ كَثِيرٗا لَّعَلَّكُمۡ تُفۡلِحُونَ ﴿١٠﴾ وَإِذَا رَأَوۡاْ تِجَٰرَةً أَوۡ لَهۡوًا ٱنفَضُّوٓاْ إِلَيۡهَا وَتَرَكُوكَ قَآئِمٗاۚ قُلۡ مَا عِندَ ٱللَّهِ خَيۡرٞ مِّنَ ٱللَّهۡوِ وَمِنَ ٱلتِّجَٰرَةِۚ وَٱللَّهُ خَيۡرُ ٱلرَّٰزِقِينَ ﴿١١﴾

سُورَةُ المُنَافِقُونَ

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

إِذَا جَآءَكَ ٱلۡمُنَٰفِقُونَ قَالُواْ نَشۡهَدُ إِنَّكَ لَرَسُولُ ٱللَّهِۗ وَٱللَّهُ يَعۡلَمُ إِنَّكَ لَرَسُولُهُۥ وَٱللَّهُ يَشۡهَدُ إِنَّ ٱلۡمُنَٰفِقِينَ لَكَٰذِبُونَ ﴿١﴾ ٱتَّخَذُوٓاْ أَيۡمَٰنَهُمۡ جُنَّةٗ فَصَدُّواْ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِۚ إِنَّهُمۡ سَآءَ مَا كَانُواْ يَعۡمَلُونَ ﴿٢﴾ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمۡ ءَامَنُواْ ثُمَّ كَفَرُواْ فَطُبِعَ عَلَىٰ قُلُوبِهِمۡ فَهُمۡ لَا يَفۡقَهُونَ ﴿٣﴾ ۞ وَإِذَا رَأَيۡتَهُمۡ تُعۡجِبُكَ أَجۡسَامُهُمۡۖ وَإِن يَقُولُواْ تَسۡمَعۡ لِقَوۡلِهِمۡۖ كَأَنَّهُمۡ خُشُبٞ مُّسَنَّدَةٞۖ يَحۡسَبُونَ كُلَّ صَيۡحَةٍ عَلَيۡهِمۡۚ هُمُ ٱلۡعَدُوُّ فَٱحۡذَرۡهُمۡۚ قَٰتَلَهُمُ ٱللَّهُۖ أَنَّىٰ يُؤۡفَكُونَ ﴿٤﴾



(٩) ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە کاتێ کە بانگ درا بۆ نوێژ لە ڕۆژی هەینیدا، ئێوە بە پەلە بچن بەدەم یادی خواوە و واز لە کڕین و فرۆشتن بهێنن، چونکە ئەو کارەتان چاکترە بۆتان ئەگەر بزانن و تێ بگەن.

(١٠) جا کاتێک نوێژ تەواو بوو، ئەوە بڵاو ببنەوە بەزەویدا و بەتەمای بەخششی خوا هەوڵ و کۆشش بدەن، یادی خوا زۆر بکەن لە هەموو چالاکیەکانی ژیاندا با ناوی ئەو زاتە لەسەر زارو لەناو دڵتاندا بێت، بۆ ئەوەی سەرفرازیی هەمیشەیی بەدەست بهێنن.

(١١) (پاشان خوا گلەیی لەزۆربەی ئیمانداران دەکات، ئەوانەی کە قافڵەی بازرگانیان بینی دەوری پێغەمبەر ﷺ یان چۆڵ کرد:) کاتێک بازرگانیەک، یان یاری و گەمەیەک ببینن، ئەوە دەچن بەدەمیەوە تۆیش بەجێ دێڵن لەکاتێکدا تۆ وەستاوی بەپێوە وتار دەخوێنیتەوە، پێیان بڵێ: ئەو پاداشت و بەشەی کەلای خوایە بۆ ئیمانداران، چاکترە لەو یاری و گەمە و بازرگانیە، خوایش چاکترین ڕۆزی بەخشە بە سەرجەم خەڵکی.

سوورەتی (المنـافقون)

بەناوی خوای بەخشندە و میهرەبان

(١) ئەی پێغەمبەر ﷺ کاتێک ناپاک و دووڕووەکان دێن بۆ لات و دەڵێن: ئێمە شایەتی دەدەین کە تۆ پێغەمبەری خوایت!! لەحاڵێکدا کە خوا خۆی چاک دەزانێت کە تۆ پێغەمبەر و فرستادەی ئەویت، لە هەمان کاتدا، خوا شایەتی دەدا کە ئەو ناپاک و دووڕووانە درۆزنن.

(٢) ئەوانە سوێندی درۆیان کردووە بە قەڵغانی خۆیان و بەو هۆیەوە بەربەستی خەڵکیان کردووە لە ڕێبازی خوا، بەڕاستی ئەوەی ئەوان دەیانکرد، کارێکی زۆر ناپەسەندو نابەجێ بوو.

(٣) ئەو حاڵەتەشیان بۆیە تێدا دروست بووە چونکە سەرەتا باوەڕیان هێنا؛ لەوەودوا حەقیان پۆشی و کافر بوونەوە، بەهۆی ئەوەوە مۆر نرا بەسەر دڵیاندا (بۆیە تێگەیشتن و بیروبۆچوونیان شێواوە و) لە ڕاستیەکان تێ ناگەن.

(٤) کاتێک دەیانبینیت سیما و لەش و لاریان سەرسامت دەکات، کاتێکیش دێنە قسە (ئەوەندە دەم بازو قسەزانن) ئەوە گوێ دەگریت بۆ قسەیان، دەڵێی داری وشکی بە دیواردا هەڵپەسێردراون، ئەوەندە لە ترس و بیمدا دەژین، هەر هاوار و بانگێک بکرێت، هەر باسێک بێتە پێشەوە، وادەزانن دژی ئەوانە، تا ئەوانە هەر دوژمنن، کەوابوو خۆتیان لێ بپارێزە، وریایان بە، خوا بیانکوژێت و لەناویان بەرێت، ئاخر بۆچی وادەکەن، بەرەو کوێ لادران (بۆچی باوەڕی دامەزراو ناهێنن و لە ڕێبازی ڕاست لادەدەن).

وَإِذَا قِيلَ لَهُمْ تَعَالَوْا يَسْتَغْفِرْ لَكُمْ رَسُولُ اللَّهِ لَوَّوْا رُءُوسَهُمْ وَرَأَيْتَهُمْ يَصُدُّونَ وَهُم مُّسْتَكْبِرُونَ ﴿٥﴾ سَوَاءٌ عَلَيْهِمْ أَسْتَغْفَرْتَ لَهُمْ أَمْ لَمْ تَسْتَغْفِرْ لَهُمْ لَن يَغْفِرَ اللَّهُ لَهُمْ إِنَّ اللَّهَ لَا يَهْدِي الْقَوْمَ الْفَاسِقِينَ ﴿٦﴾ هُمُ الَّذِينَ يَقُولُونَ لَا تُنفِقُوا عَلَىٰ مَنْ عِندَ رَسُولِ اللَّهِ حَتَّىٰ يَنفَضُّوا وَلِلَّهِ خَزَائِنُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَلَٰكِنَّ الْمُنَافِقِينَ لَا يَفْقَهُونَ ﴿٧﴾ يَقُولُونَ لَئِن رَّجَعْنَا إِلَى الْمَدِينَةِ لَيُخْرِجَنَّ الْأَعَزُّ مِنْهَا الْأَذَلَّ وَلِلَّهِ الْعِزَّةُ وَلِرَسُولِهِ وَلِلْمُؤْمِنِينَ وَلَٰكِنَّ الْمُنَافِقِينَ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٨﴾ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تُلْهِكُمْ أَمْوَالُكُمْ وَلَا أَوْلَادُكُمْ عَن ذِكْرِ اللَّهِ وَمَن يَفْعَلْ ذَٰلِكَ فَأُولَٰئِكَ هُمُ الْخَاسِرُونَ ﴿٩﴾ وَأَنفِقُوا مِن مَّا رَزَقْنَاكُم مِّن قَبْلِ أَن يَأْتِيَ أَحَدَكُمُ الْمَوْتُ فَيَقُولَ رَبِّ لَوْلَا أَخَّرْتَنِي إِلَىٰ أَجَلٍ قَرِيبٍ فَأَصَّدَّقَ وَأَكُن مِّنَ الصَّالِحِينَ ﴿١٠﴾ وَلَن يُؤَخِّرَ اللَّهُ نَفْسًا إِذَا جَاءَ أَجَلُهَا وَاللَّهُ خَبِيرٌ بِمَا تَعْمَلُونَ ﴿١١﴾

سُورَةُ التَّغَابُنِ

(٥) کاتێک پێیان بوترێت وەرن پێغەمبەری خوا، داوای لێخۆشبوونتان بۆ دەکات، سەر بادەدەن و لووت بەرزی دەکەن، دەیانبینیت روو وەردەگێرن و بەرهەڵستی دەکەن، لەکاتێکدا ئەوانە خۆیان لا گەورە دەبێت و خۆ بەزلزانن.

(٦) چونیەکە بۆیان داوای لێخۆشبوونیان بۆ بکەیت یان نەیکەیت، هەرگیز خوا لێیان خۆش نابێت، چونکە بەڕاستی خوا رێنموویی قەومی تاوانبارو لەسنوور دەرچوو نادات.

(٧) ئەوانە کەسانێکن دەڵێن بە خەڵکی: ماڵ و سامان مەبەخشن بەو کەسانەی کە لە دەوری پێغەمبەری خوادان، تا بڵاوەی لێ بکەن!! (مەبەستیان هەژارانی کۆچبەرانە، ئەی نازانن) هەرچی گەنجینەکان هەیە لە ئاسمانەکان و زەویدا هەر خوا خاوەنیانە، بەڵام دووڕووەکان ئەم راستییە تێناگەن و لە نهێنیەکان سەردەرناکەن.

(٨) ئەو دووڕووانە دەڵێن: سوێند بەخوا ئەگەر گەڕاینەوە بۆ مەدینە (دیارە کە بەو حاڵەشەوە بەشداری غەزایان کردووە، بە ناچاریی، یان بۆ تەماع و ئاشووب نانەوە) دەبێت ئەوەی کە دەسەڵاتدارو بەڕێز و پیاوماقوڵە، ئەوە دەر بکات لە شار کە بێ رێزو بێدەسەڵاتە، ئەو دووڕووانە نازانن کە: عیززەت و دەسەڵات و پایەداری هەر شایستەی خواو پێغەمبەرەکەی و ئیمانداارانە.

(٩) ئەی ئەو کەسانەی باوەڕتان هێناوە، هەوڵ بدەن نە ماڵ و سامانتان، نە رۆڵەکانتان، نەبنە هۆی ئەوەی کە لەیادی خواو بەدەستهێنانی رەزامەندی ئەو کەمتەرخەمی و بێ ئاگاتان بکەن، جا هەرکەس لە یادی خوا کەم تەرخەمی بکات، ئا ئەوانە هەر خۆیان خەسارەتمەندو زەرەرمەندن.

(١٠) لەو ماڵ و سامان و زانستی و هێزو دەسەڵاتەی کە پێمان بەخشیوون، ئێوەش لێی ببەخشن و دەستی بەسەردا مەگرن و قۆرخی مەکەن؛ پێش ئەوەی کە مردن یەخە بەیەکێکتان بگرێت و بڵێت: پەروەردگارا، خۆزگە ماوەیەکی کەمی تر مۆڵەتت بدامایە تا خێرو چاکەم بکردایە و ماڵ و سامانم ببەخشیایە و بچوومایەتە ریزی چاکانەوە...

(١١) جا ئەو داخوازیە بەجێ نیە، چونکە رۆژی هەرکەسێک تەواو بوو، کاتی مەرگی هەر کەسێک هات، هەرگیز خوا دوای ناخات و مۆڵەتی بۆ تازە ناکاتەوە، خوایش زۆر ئاگایە بە هەموو ئەو کاروکردەوانەی کە ئەنجامی دەدەن.

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

يُسَبِّحُ لِلَّهِ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلْأَرْضِ لَهُ ٱلْمُلْكُ وَلَهُ ٱلْحَمْدُ وَهُوَ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ ﴿١﴾ هُوَ ٱلَّذِي خَلَقَكُمْ فَمِنكُمْ كَافِرٌ وَمِنكُم مُّؤْمِنٌ وَٱللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ ﴿٢﴾ خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ بِٱلْحَقِّ وَصَوَّرَكُمْ فَأَحْسَنَ صُوَرَكُمْ وَإِلَيْهِ ٱلْمَصِيرُ ﴿٣﴾ يَعْلَمُ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَيَعْلَمُ مَا تُسِرُّونَ وَمَا تُعْلِنُونَ وَٱللَّهُ عَلِيمٌ بِذَاتِ ٱلصُّدُورِ ﴿٤﴾ أَلَمْ يَأْتِكُمْ نَبَؤُا۟ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ مِن قَبْلُ فَذَاقُوا۟ وَبَالَ أَمْرِهِمْ وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿٥﴾ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُۥ كَانَت تَّأْتِيهِمْ رُسُلُهُم بِٱلْبَيِّنَٰتِ فَقَالُوٓا۟ أَبَشَرٌ يَهْدُونَنَا فَكَفَرُوا۟ وَتَوَلَّوا۟ وَّٱسْتَغْنَى ٱللَّهُ وَٱللَّهُ غَنِيٌّ حَمِيدٌ ﴿٦﴾ زَعَمَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓا۟ أَن لَّن يُبْعَثُوا۟ قُلْ بَلَىٰ وَرَبِّي لَتُبْعَثُنَّ ثُمَّ لَتُنَبَّؤُنَّ بِمَا عَمِلْتُمْ وَذَٰلِكَ عَلَى ٱللَّهِ يَسِيرٌ ﴿٧﴾ فَـَٔامِنُوا۟ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ وَٱلنُّورِ ٱلَّذِيٓ أَنزَلْنَا وَٱللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرٌ ﴿٨﴾ يَوْمَ يَجْمَعُكُمْ لِيَوْمِ ٱلْجَمْعِ ذَٰلِكَ يَوْمُ ٱلتَّغَابُنِ وَمَن يُؤْمِنۢ بِٱللَّهِ وَيَعْمَلْ صَٰلِحًا يُكَفِّرْ عَنْهُ سَيِّـَٔاتِهِۦ وَيُدْخِلْهُ جَنَّٰتٍ تَجْرِي مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَآ أَبَدًا ذَٰلِكَ ٱلْفَوْزُ ٱلْعَظِيمُ ﴿٩﴾

## سوورەتی (التغـــابن)

بەناوی خوای بەخشندە و میهرەبان

(١) هەرچی لە ئاسمانەکان و هـەرچی لـە زەویـدا هەیـە یـادی خـوا بـەپاکی و بێگـەردی دەکـەن، دەسەڵات هەر بۆ ئەوە و هەر بۆ ئەویشە سـوپاس، هەر ئەویش دەسەڵاتدارە بەسەر هەموو شتێکدا.

(٢) ئەوزاتە ئەوەیە ئێـوەی دروسـت کـردووە، جـا هەتانە بێ باوەڕەو هەتانە باوەڕدار، خوایش بینایە بەهەموو ئەو کاروکردەوانەی کە ئەنجامی دەدەن.

(٣) ئەو خوایـە لەسـەر بنچینـەی حـەق و راسـتی ئاسمانـەکان و زەوی دروسـت کـردووە، وێنـەی رووخسـاری ئێوەشـی کێشـاوە بـەجوانترین شـێوە، گەڕانەوەو سەرئەنجامیش هەر بۆ لای ئەوە.

(٤) هـەرچی لـە ئاسمانـەکان و زەویـدا هەیـە و دەگوزەرێت، خـوا ئاگـاو زانایـە پێـی، هـەروەها دەزانێت چی پەنهان دەکەن و چی ئاشکرا دەکـەن، هەمیشە ئەو خوایە زانایـە بـە هـەرچی لـە پێچ و پەنای سینەکاندا حەشاردراوە.

(٥) ئایا هەواڵی ئەوانـەتان پـێ نەگەیشـتووە کـە پێشـتر بـێ بڕوا بـوون، چۆن سزاو ئـازاری کـارو کردوەکانیـان چەشـت لـە دنیـادا، لـە قیامەتیشـدا سـزای بـەئێش و ئـازار بۆیـان ئامادەیـە (چونکـە تاوانی بێ بـاوەڕی زۆر گەورەیـە و سـەرچاوەیە بـۆ هەموو گوناهـ و تاوانێک).

(٦) ئەوەش بۆیە پێشهات چونکە پێغەمبەران بەجۆرەها بەڵگەو موعجیزە، پەیامی خوایـان پێڕاگـەیاندن کـەچی وتیـان: ئەمانە بەشەرن وەکو ئێمە، چۆن دەبنە پێغەمبەرو چاوساغمان؟، بـەو بیـانووە رێبـازی بـێ باوەڕیـان هـەڵبژاردو پشـتیان هەڵکرد، خوایش پێویستی بەئیمانی ئەوان نیە چونکە خوا خۆی دەوڵەمەندو بێنیازە و شایستەی سوپاسە.

(٧) ئەوانەی بێ باوەڕ بوون بـە بۆچوونـی خۆیـان وتیـان: هـەرگیز زینـدوو ناکرێنـەوە، پێیـان بڵـێ: وا نیـیـە، سـوێند بـە پەروەرگارم، بەڕاستی هەر زیندوو دەکرێنەوە، پاشان ئاگادار دەکرێـن لـە هـەموو ئـەو کـارو کردەوانـەی کـە ئـەنجامتان دەدا، ئەوەش بۆ خوا زۆر ئاسان و سادەیە.

(٨) کەواتە تا زووە باوەڕ بهێنن بەخواو بـە پێغەمبەرەکـەی و بـەو نـوور و رۆشـناییەی کـە ناردوومانەتـە خـوارەوە(کـە قورئانە)، دڵنیاش بن کە خوا ئاگایە بە هەموو ئەو کاروکردەوانەی کە ئەنجامی دەدەن.

(٩) رۆژێک دێت خـوا هەمووانتان کۆدەکاتەوە، بۆ رۆژی کۆبوونەوەکـە، ئـەوە رۆژی زیـان بارییـە، جـا ئـەوەی ئیمـان و باوەڕ بهێنێت بەخواو کردەوەی چاکیش ئـەنجام بدات، ئـەوە خـوا چاوپۆشـی دەکـات لـە گونـاهو هەڵـەکانی و دەیخاتـە باخەکانی بەهەشتەوە کە چەندەها روبار بەژێر درەختەکانیدا دەڕوات، هاوڕێ لەگەڵ ژیانی نـەبڕاوەدا بـۆ هەمیشـەو هـەتا هەتایی، ئەوەیە سەرکەوتن و سەرفرازی گەورەو بێسنوور.

وَالَّذِينَ كَفَرُوا وَكَذَّبُوا بِآيَاتِنَا أُولَٰئِكَ أَصْحَابُ النَّارِ خَالِدِينَ فِيهَا ۖ وَبِئْسَ الْمَصِيرُ ﴿١٠﴾ مَا أَصَابَ مِن مُّصِيبَةٍ إِلَّا بِإِذْنِ اللَّهِ ۗ وَمَن يُؤْمِن بِاللَّهِ يَهْدِ قَلْبَهُ ۚ وَاللَّهُ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمٌ ﴿١١﴾ وَأَطِيعُوا اللَّهَ وَأَطِيعُوا الرَّسُولَ ۚ فَإِن تَوَلَّيْتُمْ فَإِنَّمَا عَلَىٰ رَسُولِنَا الْبَلَاغُ الْمُبِينُ ﴿١٢﴾ اللَّهُ لَا إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ۚ وَعَلَى اللَّهِ فَلْيَتَوَكَّلِ الْمُؤْمِنُونَ ﴿١٣﴾ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِنَّ مِنْ أَزْوَاجِكُمْ وَأَوْلَادِكُمْ عَدُوًّا لَّكُمْ فَاحْذَرُوهُمْ ۚ وَإِن تَعْفُوا وَتَصْفَحُوا وَتَغْفِرُوا فَإِنَّ اللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿١٤﴾ إِنَّمَا أَمْوَالُكُمْ وَأَوْلَادُكُمْ فِتْنَةٌ ۚ وَاللَّهُ عِندَهُ أَجْرٌ عَظِيمٌ ﴿١٥﴾ فَاتَّقُوا اللَّهَ مَا اسْتَطَعْتُمْ وَاسْمَعُوا وَأَطِيعُوا وَأَنفِقُوا خَيْرًا لِّأَنفُسِكُمْ ۗ وَمَن يُوقَ شُحَّ نَفْسِهِ فَأُولَٰئِكَ هُمُ الْمُفْلِحُونَ ﴿١٦﴾ إِن تُقْرِضُوا اللَّهَ قَرْضًا حَسَنًا يُضَاعِفْهُ لَكُمْ وَيَغْفِرْ لَكُمْ ۚ وَاللَّهُ شَكُورٌ حَلِيمٌ ﴿١٧﴾ عَالِمُ الْغَيْبِ وَالشَّهَادَةِ الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ ﴿١٨﴾

سُورَةُ الطَّلَاقِ

(١٠) ئه‌وانه‌ش كه بێباوه‌ڕ بوون و ئایه‌ت و فه‌رمانه‌كانی ئێمه‌یان به‌درۆزانی، ئا ئه‌وانه نیشته‌جێی ناو ئاگرن و ژیانی نه‌بڕاوه تیایدا ده‌به‌نه سه‌ر، ئای كه سه‌رئه‌نجامێكی زۆر ناخۆش و ناله‌باره.

(١١) به‌فه‌رمانی خوا نه‌بێت هیچ خۆشی و ناخۆشیه‌ك پێش نه‌هاتووه، جا ئه‌وه‌ی باوه‌ڕی ته‌واو بهێنێت، خوا دڵی ڕێنموویی ده‌كات بۆ لای خۆی، (هه‌ر بارودۆخێكی به‌سه‌ردا بێت، له خۆشی و ناخۆشی به‌تاقیكردنه‌وه‌ی ده‌زانێت) خوای گه‌وره‌ش هه‌میشه به‌هه‌موو شتێك زانایه.

(١٢) فه‌رمانبه‌رداریی خوا بكه‌ن و فه‌رمانبه‌رداریی پێغه‌مبه‌ریش ﷺ بكه‌ن، جا ئه‌گه‌ر پشت هه‌ڵكه‌ن و گوێڕایه‌ڵ نه‌بن ئه‌وه خۆتان زه‌ره‌ر ده‌كه‌ن، ئه‌گینا ته‌نها گه‌یاندنی ڕوون و ئاشكرای په‌یامه‌كه‌ی، ئه‌ركی سه‌رشانی پێغه‌مبه‌ره‌كه‌مانه.

(١٣) ـ الله ـ خوایه‌كه جگه له‌و خوایه‌كی تر نی‌یه كه دروستكار بێت و خاوه‌نی فه‌رمان بێت، ده‌با ئه‌وانه‌ی ئیماندارن هه‌ر پشت به‌و خوایه ببه‌ستن و داوای یارمه‌تی هه‌ر له‌و بكه‌ن.

(١٤) ئه‌ی ئه‌وانه‌ی باوه‌ڕتان هێناوه.. هه‌ندێك له هاوسه‌رانتان یان هه‌ندێك له ڕۆڵه‌و نه‌وه‌كانتان دوژمنتانن.. جا ئێوه‌ش وریابن و خۆتان بپارێزن لێیان، جا ئه‌گه‌ر چاوپۆشی له هه‌ڵه‌یان بكه‌ن و واز له ئازاردانیان بهێنن و لێیان ببورن ، ئه‌وه چاك بزانن كه خوا لێخۆشبووه و میهره‌بانه.

(١٥) دڵنیابن كه ماڵ و سامان و ڕۆڵه و نه‌وه‌كانتان بۆ تاقی كردنه‌وه‌تانن، (ئه‌گه‌ر له‌و بوارانه‌دا سه‌ركه‌وتن به‌ده‌ست بهێنن)، خوای میهره‌بان پاداشتی گه‌وره و زۆری له لایه بۆ خۆگرو لێبورده‌كان.

(١٦) كه‌وابوو هه‌تا ده‌توانن به‌ته‌قواو خواناس بن، گوێڕایه‌ڵ و فه‌رمانبه‌ردار بن، خێرو چاكه‌ش بكه‌ن، ئه‌وانه هه‌مووی بۆ خۆتان چاكه، جا ئه‌وه‌ی خۆی بپارێزێت له ڕه‌زیلی و ڕژدی نه‌فسی خۆی، ئا ئه‌وانه هه‌ر خۆیان سه‌رفرازن.

(١٧) ئه‌گه‌ر قه‌رز بده‌ن به‌خوا، به‌شێوه‌یه‌كی چاك (مه‌به‌ست به‌خشینی ماڵ و سامانه له پێناوی خوادا) ئه‌وه خوا چه‌ند به‌رابه‌ری ده‌كات بۆتان، هه‌روه‌ها لێتان خۆش ده‌بێت خوایش سوپاسگوزاره (له‌سه‌ر به‌خشین كه هه‌ر به‌خششی خۆیه‌تی) و خۆڕاگره (مۆڵه‌تی ڕه‌زیله‌كانیش ده‌دات تا كاتی خۆی).

(١٨) ئه‌و زاته ئاگاداری نهێنی و ئاشكرایه، خوایه‌كی باڵاده‌ست و دانایه.

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ



يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ إِذَا طَلَّقْتُمُ ٱلنِّسَآءَ فَطَلِّقُوهُنَّ لِعِدَّتِهِنَّ وَأَحْصُواْ ٱلْعِدَّةَ ۖ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ رَبَّكُمْ ۖ لَا تُخْرِجُوهُنَّ مِنۢ بُيُوتِهِنَّ وَلَا يَخْرُجْنَ إِلَّآ أَن يَأْتِينَ بِفَٰحِشَةٍ مُّبَيِّنَةٍ ۚ وَتِلْكَ حُدُودُ ٱللَّهِ ۚ وَمَن يَتَعَدَّ حُدُودَ ٱللَّهِ فَقَدْ ظَلَمَ نَفْسَهُۥ ۚ لَا تَدْرِى لَعَلَّ ٱللَّهَ يُحْدِثُ بَعْدَ ذَٰلِكَ أَمْرًا ﴿١﴾ فَإِذَا بَلَغْنَ أَجَلَهُنَّ فَأَمْسِكُوهُنَّ بِمَعْرُوفٍ أَوْ فَارِقُوهُنَّ بِمَعْرُوفٍ وَأَشْهِدُواْ ذَوَىْ عَدْلٍ مِّنكُمْ وَأَقِيمُواْ ٱلشَّهَٰدَةَ لِلَّهِ ۚ ذَٰلِكُمْ يُوعَظُ بِهِۦ مَن كَانَ يُؤْمِنُ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْءَاخِرِ ۚ وَمَن يَتَّقِ ٱللَّهَ يَجْعَل لَّهُۥ مَخْرَجًا ﴿٢﴾ وَيَرْزُقْهُ مِنْ حَيْثُ لَا يَحْتَسِبُ ۚ وَمَن يَتَوَكَّلْ عَلَى ٱللَّهِ فَهُوَ حَسْبُهُۥٓ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ بَٰلِغُ أَمْرِهِۦ ۚ قَدْ جَعَلَ ٱللَّهُ لِكُلِّ شَىْءٍ قَدْرًا ﴿٣﴾ وَٱلَّٰٓـِٔى يَئِسْنَ مِنَ ٱلْمَحِيضِ مِن نِّسَآئِكُمْ إِنِ ٱرْتَبْتُمْ فَعِدَّتُهُنَّ ثَلَٰثَةُ أَشْهُرٍ وَٱلَّٰٓـِٔى لَمْ يَحِضْنَ ۚ وَأُوْلَٰتُ ٱلْأَحْمَالِ أَجَلُهُنَّ أَن يَضَعْنَ حَمْلَهُنَّ ۚ وَمَن يَتَّقِ ٱللَّهَ يَجْعَل لَّهُۥ مِنْ أَمْرِهِۦ يُسْرًا ﴿٤﴾ ذَٰلِكَ أَمْرُ ٱللَّهِ أَنزَلَهُۥٓ إِلَيْكُمْ ۚ وَمَن يَتَّقِ ٱللَّهَ يُكَفِّرْ عَنْهُ سَيِّـَٔاتِهِۦ وَيُعْظِمْ لَهُۥٓ أَجْرًا ﴿٥﴾

## سوورەتی (الطلاق)

بەناوی خوای بەخشندە و میهرەبان

(١) ئەی پێغەمبەر ﷺ (بەئوممەتت رابگەیەنە) کاتێک ژنانتان تەلاق دەدەن لەکاتی دیاری کراویاندا تەلاقیان بدەن (کە بریتیە لەو کاتەی کە ئافرەت لە عادەی مانگانە پاکْ بۆتەوە)، حسابی ئەوکاتەش بە وردی رابگرن، لە پەروەردگاریشتان بترسن و ماوەکەیان بۆ درێژ مەکەنەوە (ئەگەر لەو کاتە دیاریکراوانەدا یەکجار تەلاقتان دان، ئەوە با ئەو ئافرەتە لە ماڵەکەی خۆیدا بمێنێتەوە و) دەریان مەکەن لەماڵەکانی خۆیاندا، ئافرەتەکانیش با لە ماڵ دەرنەچن، مەگەر کارێکی ناشرین و نارەوای ئاشکرا ئەنجام بدەن، (ئەوکاتە با لە ماڵ نەمێنن و بچن بۆ ماڵی مەحرەمێکیان)، ئا ئەوەیە سنووری خوا لە بارەی تەلاقەوە، ئەوەی لە سنووری خوا بترازێت ئەوە ستەم لە خۆی دەکات، ئەی ئیماندار: تۆ نازانیت لەوانەیە دوای ئەو (تێکچوون و ساردییە) خوای گەورە بارودۆخێک پێش بهێنێت (کە ئاشت ببنەوە و رێک بکەونەوە و بۆیە نابێت لە ماڵ دەرچن).

(٢) کاتێک گەیشتنە ماوەی دیاریکراوی خۆیان (دوای یەک، یان ئەو دوو تەلاقە کە خواردویانە)، ئینجا یان بیانهێڵنەوە لای خۆتان هاوڕێ لەگەڵ رەفتارو هەڵسوکەوتی چاکدا، یاخود وازیان لێبهێنن و لێیان جیاببنەوە (لە سێهەم جاردا کە تەلاقتان خوارد) بەشێوەیەکی جوان کە مافیان پارێزراو بێت، لە کاتی جیابوونەوەی یەکجاریدا با دوو شایەتی دادپەروەرو خواناس لە خۆتان لە نێواندا هەبێت و ئامادەی شایەتی ببن و بیپارێزن بۆ خواو لەبەر خوا، بەوەی کەباسکرا ئامۆژگاری دەکرێت ئەو کەسەی باوەڕ بە خواو رۆژی دوایی دەهێنێت، جا ئەوەی لە خوا بترسێت و پارێزکار بێت، ئەوە خوا دەرووی لێ دەکاتەوە ...

(٣) لە شوێنێکەوە رزق و رۆزی پێ دەبەخشێت کە حسابی بۆ نەکردبێت و خۆی پێی نازانێت، جا ئەوەی پشت بە خوا ببەستێت، ئەو زاتەی بەسە، بۆ ئەوەی یاریدەدەری بێت، چونکە بەڕاستی خوا کارو فەرمانی خۆی بە ئەنجام دەگەیەنێت، بێگومان خوا بۆ هەموو شتێک نەخشەیەکی دیاریکراوی بڕیارداوە (کە دەبێت پەیڕەوی بکرێت).

(٤) ئەو ئافرەتانەی کە نائومێد بوون لە عادەتی مانگانە لە هاوسەرەکانتان، ئەگەر کەوتنە گومانەوە کە ئاخۆ عادەتی مانگانەیان مابێت یان نا، ئەوە سێ مانگ چاوەڕێ بکەن، هەروەها ئەوانەش کە بەهۆی کەم تەمەنیەوە هێشتا نەکەوتونەتە عادەوە، ئەوانیش سێ مانگ چاوەڕێ بکەن، ئەو ئافرەتانەش کە سکیان هەیە ماوەکەیان ئەوەندەیە تا سکەکەیان دادەنێن، جا ئەوەی کە لە خوا بترسێت و پارێزکار بێت، ئەوە خوا کاری بۆ ئاسان دەکات.

(٥) ئا ئەوە فەرمان و سنووری خوایە کە ناردوویەتیە خوارەوە بۆتان، ئەوەی لە خوا بترسێت و پارێزکار بێت، خوا گوناهەکانی دەسڕێتەوە و چاوپۆشی لێ دەکات و پاداشتەکەی بۆ گەورەو بێ سنوور دەکات.

أَسْكِنُوهُنَّ مِنْ حَيْثُ سَكَنتُم مِّن وُجْدِكُمْ وَلَا تُضَارُّوهُنَّ لِتُضَيِّقُوا۟ عَلَيْهِنَّ ۚ وَإِن كُنَّ أُو۟لَٰتِ حَمْلٍ فَأَنفِقُوا۟ عَلَيْهِنَّ حَتَّىٰ يَضَعْنَ حَمْلَهُنَّ ۚ فَإِنْ أَرْضَعْنَ لَكُمْ فَـَٔاتُوهُنَّ أُجُورَهُنَّ ۖ وَأْتَمِرُوا۟ بَيْنَكُم بِمَعْرُوفٍ ۖ وَإِن تَعَاسَرْتُمْ فَسَتُرْضِعُ لَهُۥٓ أُخْرَىٰ ﴿٦﴾ لِيُنفِقْ ذُو سَعَةٍ مِّن سَعَتِهِۦ ۖ وَمَن قُدِرَ عَلَيْهِ رِزْقُهُۥ فَلْيُنفِقْ مِمَّآ ءَاتَىٰهُ ٱللَّهُ ۚ لَا يُكَلِّفُ ٱللَّهُ نَفْسًا إِلَّا مَآ ءَاتَىٰهَا ۚ سَيَجْعَلُ ٱللَّهُ بَعْدَ عُسْرٍ يُسْرًا ﴿٧﴾ وَكَأَيِّن مِّن قَرْيَةٍ عَتَتْ عَنْ أَمْرِ رَبِّهَا وَرُسُلِهِۦ فَحَاسَبْنَٰهَا حِسَابًا شَدِيدًا وَعَذَّبْنَٰهَا عَذَابًا نُّكْرًا ﴿٨﴾ فَذَاقَتْ وَبَالَ أَمْرِهَا وَكَانَ عَٰقِبَةُ أَمْرِهَا خُسْرًا ﴿٩﴾ أَعَدَّ ٱللَّهُ لَهُمْ عَذَابًا شَدِيدًا ۖ فَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ يَٰٓأُو۟لِى ٱلْأَلْبَٰبِ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ۚ قَدْ أَنزَلَ ٱللَّهُ إِلَيْكُمْ ذِكْرًا ﴿١٠﴾ رَّسُولًا يَتْلُوا۟ عَلَيْكُمْ ءَايَٰتِ ٱللَّهِ مُبَيِّنَٰتٍ لِّيُخْرِجَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ مِنَ ٱلظُّلُمَٰتِ إِلَى ٱلنُّورِ ۚ وَمَن يُؤْمِنۢ بِٱللَّهِ وَيَعْمَلْ صَٰلِحًا يُدْخِلْهُ جَنَّٰتٍ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَآ أَبَدًا ۖ قَدْ أَحْسَنَ ٱللَّهُ لَهُۥ رِزْقًا ﴿١١﴾ ٱللَّهُ ٱلَّذِى خَلَقَ سَبْعَ سَمَٰوَٰتٍ وَمِنَ ٱلْأَرْضِ مِثْلَهُنَّ يَتَنَزَّلُ ٱلْأَمْرُ بَيْنَهُنَّ لِتَعْلَمُوٓا۟ أَنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ وَأَنَّ ٱللَّهَ قَدْ أَحَاطَ بِكُلِّ شَىْءٍ عِلْمًۢا ﴿١٢﴾

(٦) ئەو ئافرەتانەی کە تەلاقێک یان دووانیان ماوە، بەگوێرەی تواناتان جێگە و ڕێگەیان بۆ دابین بکەن لەلای خۆتان، نەکەن ئازاریان بدەن و تەنگەتاویان بکەن و زۆریان بۆ بهێنن، خۆ ئەگەر سکیان هەبوو، (ئەگەر سێ تەلاقەش درابوون) هەر بەخێویان بکەن و مەسرەفیان بکێشن هەتا سکەکەیان دادەنێن، خۆ ئەگەر هاتوو منداڵەکەیان بەشیر گۆشکردو بەخێویان کرد ئەوە حەقی خۆیان بدەنێ، دەکرێت بەشێوەیەکی جوان و چاک ڕاوێژ لەناویەکدا بکەن بۆ بەخێو کردنی منداڵەکە، خۆ ئەگەر پێک نەهاتن و ناکۆک بوون، ئەوە دەکرێت ئافرەتێکی تر منداڵەکەی بۆ بەخێو بکات و شیری پێ بدات.

(٧) جا ئەوەی دەوڵەمەندە با بەگوێرەی دەوڵەمەندیەکەی بەخشندەبێت، ئەوەیش کە کەم دەستەو هەژارە، با لەوە ببەخشێت کە خوا پێی بەخشیوە، چونکە خوا بەگوێرەی دارایی هەر کەسێک داوای بەخشین دەکات، دڵنیاش بن کە خوا دوای تەنگانە هەرزانی دەهێنێت، دوای ناخۆشی خۆشی دەهێنێت.

(٨) لە سەدەکانی پێشوودا چەندەها شارو شارۆچکە یاخی بوون لە فەرمانی پەروەردگاریان و فرستادەکانی، ئێمە زۆر بەتوندیی حسابمان بۆ کردن و سزایەکی توندو پڕئێشمان بۆ پێشهێنان.

(٩) ئیتر گیرۆدەی بەڵای خۆیان بوون و ئەو سزایەیان چەشت کە خۆیان دەست پێشکەریان بۆ کردبوو، سەرئەنجامی کارو کردەوەی خەڵکی ئەو شوێنانەش زیانێکی گەورە بوو.(ئەویش ئەمەیە کە)...

(١٠) لە قیامەتیشدا خوا سزای بەئێشی لەناو دۆزەخدا بۆ ئامادەکردوون، دەی کەواتە ئەی ڕۆشنبیرەکان، ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە؛ لە خوا بترسن و پارێزکار بن و دڵنیابن خوای گەورە قورئانی بۆ ئێوە دابەزاندووە...

(١١) هەروەها پێغەمبەرێک کە ئایەتە روونەکانی خواتان بەسەردا دەخوێنێتەوە، تا ئەوانەی کە باوەڕیان هێناوە و کردەوە چاکەکانیان ئەنجام داوە لە تاریکی‌یەکان دەریان بهێنێت و ڕزگاریان بکات و بیانخاتە ناو نوورو روناکیەوە، جا ئەوەی باوەڕ بهێنێت بەخواو کردەوەی چاک ئەنجام بدات، ئەوە دەیخاتە باخەکانی بەهەشتەوە کە چەندەها روبار بەژێر درەخت و بە بەردەم کۆشکەکانیدا دەڕوات و لەوێ ژیانی هەمیشەیی و هەتاهەتایی دەبەنە سەر، بێگومان خوا رزق و ڕۆزی چاک و پاک و فرەو فراوانی بۆ ئامادە کردوون.

(١٢) خوا ئەو زاتەیە کە حەوت چین ئاسمانی دروست کردووە و فەرمانی خوا لە نێوانیاندا دادەبەزێت، هەروەها بەوێنەی ئەوان فەرمانی خوا بۆ زەویش دادەبەزێت و جێبەجێ دەکرێت ، بۆ ئەوەی بزانن کە بەراستی خوا دەسەڵاتی بەسەر هەموو شتێکدا هەیە، بێگومان خوا بە زانستی و زانیاری خۆی گەمارۆی هەموو شتێکی داوە.



سوورەتی (التحریـــم)

بەناوی خوای بەخشندە و میهرەبان

(١) ئەی پێغەمبەر تۆ بۆچی شتێک لە خۆت حەرام دەکەیت کە خوا بۆی حەڵاڵ کردویت، دەتەوێت بەو کارە هاوسەرەکانت رازی بکەیت؟! لەکاتێکدا هەر خوا لێخۆشبوو میهرەبانە.

(٢) بەراستی خوا هەڵوەشاندنەوەی سوێندەکانتانی بۆ بڕیارداون (بەوەی کەفارەتی بدەن)، ئەو خوایە گەورەتانە و پشتیوان و یارمەتی دەرتانە، هەر ئەویش زاتێکی زاناو دانایە.

(٣) کاتێک پێغەمبەر ﷺ قسەیەکی نهێنی لای هەندێک لە خێزانەکانی درکاند (کە ئەویش دایکە حفصە بوو)، جا کاتێک ئەویش باسەکەی گەیاندە دایکە عائشە خوایش پێغەمبەری ئاگادارکرد لە رازو نیازیان و باسی هەندێک لە رازەکەی کردو باسی هەندێکی نەکرد، (پێغەمبەر ﷺ گلەیی لە دایکە حفصە کرد، دەربارەی درکاندنی نهێنیەکە) دایکە حفصە پرسی: کێ ئەم هەواڵەی پێگەیاندیت؟ پێغەمبەر ﷺ وتی: خوای زاناو ئاگا منی ئاگادار کرد، (ئەم چەند ئایەتە دەربارەی رووداوێکی تایبەتیە لە ژیانی پێغەمبەردا ﷺ کە لەکتێبەکانی سیرەدا باس کراوە).

(٤) (بۆیە خوای گەورە پێیان دەفەرموێت:) ئەگەر هەردووکتان داوای تەوبە و پەشیمانی بکەن و بگەڕێنەوە بۆ لای خوا، ئەوە باشە، چونکە دڵەکانتان لەخشتە چوو بوو و ترازا بوو، خۆ ئەگەر پشتی یەکتر بگرن دژ بە پێغەمبەر ﷺ، ئەوە چاک بزانن کە خوا خۆی یاریدەدەریەتی و هەروەها جوبرەئیل و ئیماندارە چاکەکان، فریشتەکانیش لەوەودوا پشتیوانن بۆی.

(٥) ئەگەر پێغەمبەر ﷺ تەڵاقتان بدات، ئەوە نزیکە خوا هاوسەرانی چاکتر لە ئێوەی پێ ببەخشێت، موسڵمان و باوەڕدار، ملکەچی پەروەردگار، زوو لە هەڵە پەشیمان، خواپەرست و دیندار، رۆژووەوان، یان بێوەن هۆشیان لەکاردایە و سەرنجی دروست کراوانی خوا دەدەن، هەروەها ئەو ئافرەتانە هەیانە بێوەن و هەیانە کچن...

(٦) ئەی ئەو کەسانەی کە باوەڕتان هێناوە خۆتان و کەسوکارتان بپارێزن لە ئاگرێک کە سووتەمەنیەکەی خەڵکی و بەردە، سەرپەرشتیاری ئەو دۆزەخ و ئاگرە، جۆرە فریشتەیەکن کە زۆر دڵڕەق و تووندو تیژن، نافەرمانی خوا ناکەن لە هیچ شتێکدا کە فەرمانیان پێ بدات و هەرچی فەرمانێکیان پێ بدرێت ئەنجامی دەدەن.

(٧) ئەی ئەوانەی کە بێ باوەڕ بوون ئەمڕۆ هیچ پاکانەیەک مەکەن، چونکە ئێوە بەراستی تەنها پاداشتی ئەو کارو کردەوانەتان دەدرێتەوە کە ئەنجامتان دەدا.

يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ تُوبُوٓاْ إِلَى ٱللَّهِ تَوْبَةً نَّصُوحًا عَسَىٰ رَبُّكُمْ أَن يُكَفِّرَ عَنكُمْ سَيِّـَٔاتِكُمْ وَيُدْخِلَكُمْ جَنَّٰتٍ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ يَوْمَ لَا يُخْزِى ٱللَّهُ ٱلنَّبِىَّ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مَعَهُۥ ۖ نُورُهُمْ يَسْعَىٰ بَيْنَ أَيْدِيهِمْ وَبِأَيْمَٰنِهِمْ يَقُولُونَ رَبَّنَآ أَتْمِمْ لَنَا نُورَنَا وَٱغْفِرْ لَنَآ ۖ إِنَّكَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ ﴿٨﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِىُّ جَٰهِدِ ٱلْكُفَّارَ وَٱلْمُنَٰفِقِينَ وَٱغْلُظْ عَلَيْهِمْ ۚ وَمَأْوَىٰهُمْ جَهَنَّمُ ۖ وَبِئْسَ ٱلْمَصِيرُ ﴿٩﴾ ضَرَبَ ٱللَّهُ مَثَلًا لِّلَّذِينَ كَفَرُواْ ٱمْرَأَتَ نُوحٍ وَٱمْرَأَتَ لُوطٍ ۖ كَانَتَا تَحْتَ عَبْدَيْنِ مِنْ عِبَادِنَا صَٰلِحَيْنِ فَخَانَتَاهُمَا فَلَمْ يُغْنِيَا عَنْهُمَا مِنَ ٱللَّهِ شَيْـًٔا وَقِيلَ ٱدْخُلَا ٱلنَّارَ مَعَ ٱلدَّٰخِلِينَ ﴿١٠﴾ وَضَرَبَ ٱللَّهُ مَثَلًا لِّلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱمْرَأَتَ فِرْعَوْنَ إِذْ قَالَتْ رَبِّ ٱبْنِ لِى عِندَكَ بَيْتًا فِى ٱلْجَنَّةِ وَنَجِّنِى مِن فِرْعَوْنَ وَعَمَلِهِۦ وَنَجِّنِى مِنَ ٱلْقَوْمِ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿١١﴾ وَمَرْيَمَ ٱبْنَتَ عِمْرَٰنَ ٱلَّتِىٓ أَحْصَنَتْ فَرْجَهَا فَنَفَخْنَا فِيهِ مِن رُّوحِنَا وَصَدَّقَتْ بِكَلِمَٰتِ رَبِّهَا وَكُتُبِهِۦ وَكَانَتْ مِنَ ٱلْقَٰنِتِينَ ﴿١٢﴾

(٨) ئەی ئەو کەسانەی کە باوەڕتان هێناوە، ئێوە بە تەوبە و پەشیمانیەکی پەخت و دڵسۆزانەوە روو بکەنەوە خوا، نزیکە پەروەردگارتان لە هەڵە و گوناهەکانتان خۆش ببێت و بتانخاتە باخەکانی بەهەشتەوە کە چەندەها و روبار بەژێر درەخت و کۆشکەکانیدا دەڕوات، رۆژێک دێت کە خوا پێغەمبەر و ئەوانەی لە خزمەتیدان خەجاڵەت و شەرمەزار ناکات، نوورو روناکیان دەدرەوشێتەوەو دێت و دەچێت لە بەردەم و لای راستیانەوە و دەڵێن: پەروەردگارا ئەم نوورو روناکیەمان بۆ زیاد بکەو لێمان خۆش ببە، چونکە بەراستی تۆ دەسەڵاتت بەسەر هەموو شتێکدا هەیە.

(٩) ئەی پێغەمبەرﷺ کۆشش بکە و بجەنگە ژی کافر و دووڕوەکان و توندو تیژبە لەسەریان، ئەوانە شوێنیان دۆزەخە، ئای کە سەرەنجامێکی خراپە.

(١٠) خوا نموونەی هێناوەتەوە بە ژنی نوح و وط بۆ ئەوانەی کە بێباوەڕ بوون، کە ئەو دوو ئافرەتە هاوسەری دوو بەندەی چاک و پاکی ئێمە بوون، کەچی خیانەتیان لێ کردن (باوەڕیان پێیان نەبوو، ئەیبەتیان دەکردن، گاڵتەیان پێدەکردن...)، ئیتر ئەو پێغەمبەرانە فریای هاوسەرەکانیان نەکەوتن، لە قیامەتدا ئەو ژنانە دەوترێت: بچنە ناو ئاگری دۆزەخەوە لەگەڵ ئەوانەدا کە دەچنە ناوی.

(١١) هەروەها خوا نموونەی هێناوەتەوە بە هاوسەرەکەی فیرعەون بۆ ئەوانەی کە باوەڕیان هێناوە، کاتێک وتی: پەروەردگارا لەلای خۆت لە بەهەشتداماڵێکم بۆ دروست بکە (تا بەردەوام بەدیدارت شاد ببم) و لە دەست فیرعەون و کاروکردەوەی رزگارم بکە و لە دەست ئەم قەومە ستەمکارەش دەربازم بکە.

(١٢) هەروەها نموونەی هێناوەتەوە بە مەریەمی کچی عیمرانیش کە داوێنی خۆی بەپاکی راگرت، ئێمەش لەو ژحەی کە بەدەستمانە، فوومان پێداکرد، ئەویش باوەڕی تەواوی هەبوو بە گوفتارو فەرمانەکانی پەروەردگاری و بەمیشە و بەردەوام ملکەچ و فەرمانبەردارو خواناس و نزاکار بوو.

سُورَةُ المُلْك

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ



تَبَٰرَكَ ٱلَّذِى بِيَدِهِ ٱلْمُلْكُ وَهُوَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ ﴿١﴾ ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلْمَوْتَ وَٱلْحَيَوٰةَ لِيَبْلُوَكُمْ أَيُّكُمْ أَحْسَنُ عَمَلًا وَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْغَفُورُ ﴿٢﴾ ٱلَّذِى خَلَقَ سَبْعَ سَمَٰوَٰتٍ طِبَاقًا مَّا تَرَىٰ فِى خَلْقِ ٱلرَّحْمَٰنِ مِن تَفَٰوُتٍ فَٱرْجِعِ ٱلْبَصَرَ هَلْ تَرَىٰ مِن فُطُورٍ ﴿٣﴾ ثُمَّ ٱرْجِعِ ٱلْبَصَرَ كَرَّتَيْنِ يَنقَلِبْ إِلَيْكَ ٱلْبَصَرُ خَاسِئًا وَهُوَ حَسِيرٌ ﴿٤﴾ وَلَقَدْ زَيَّنَّا ٱلسَّمَآءَ ٱلدُّنْيَا بِمَصَٰبِيحَ وَجَعَلْنَٰهَا رُجُومًا لِّلشَّيَٰطِينِ وَأَعْتَدْنَا لَهُمْ عَذَابَ ٱلسَّعِيرِ ﴿٥﴾ وَلِلَّذِينَ كَفَرُوا۟ بِرَبِّهِمْ عَذَابُ جَهَنَّمَ وَبِئْسَ ٱلْمَصِيرُ ﴿٦﴾ إِذَآ أُلْقُوا۟ فِيهَا سَمِعُوا۟ لَهَا شَهِيقًا وَهِىَ تَفُورُ ﴿٧﴾ تَكَادُ تَمَيَّزُ مِنَ ٱلْغَيْظِ كُلَّمَآ أُلْقِىَ فِيهَا فَوْجٌ سَأَلَهُمْ خَزَنَتُهَآ أَلَمْ يَأْتِكُمْ نَذِيرٌ ﴿٨﴾ قَالُوا۟ بَلَىٰ قَدْ جَآءَنَا نَذِيرٌ فَكَذَّبْنَا وَقُلْنَا مَا نَزَّلَ ٱللَّهُ مِن شَىْءٍ إِنْ أَنتُمْ إِلَّا فِى ضَلَٰلٍ كَبِيرٍ ﴿٩﴾ وَقَالُوا۟ لَوْ كُنَّا نَسْمَعُ أَوْ نَعْقِلُ مَا كُنَّا فِىٓ أَصْحَٰبِ ٱلسَّعِيرِ ﴿١٠﴾ فَٱعْتَرَفُوا۟ بِذَنۢبِهِمْ فَسُحْقًا لِّأَصْحَٰبِ ٱلسَّعِيرِ ﴿١١﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَخْشَوْنَ رَبَّهُم بِٱلْغَيْبِ لَهُم مَّغْفِرَةٌ وَأَجْرٌ كَبِيرٌ ﴿١٢﴾

## سوورەتی (الملك)

بەناوی خوای بەخشندە و میهرەبان

(١) گەورە و موبارەکە و پیرۆزە، ئەو زاتەی کە هەموو بوونەوەرو جیهانی بەدەستە، ئەو زاتەی دەسەڵاتی بەسەر هەموو شتێکدا هەیە.

(٢) هەر ئەو خۆی مردن و ژیانی بەدیهێناوە، تا تاقیتان بکاتەوە، کێتان کردەوەی چاکترو پەسەندترە، هەر ئەویش زاتێکی باڵادەستە بەسەر بێباوەڕاندا، وە لێخۆشبووە لە ئیمانداران.

(٣) هەروەها ئەو زاتە ئاسمانەکانی بە حەوت چین دروست کردووە، لە نێو بەدیهێنراوەکانی ئەو خوای میهرەبانەدا هیچ ناڕێکی و ناتەواویەک بەدی ناکەیت، ئەی ئینسان: هەرچاو بگێڕە و سەرنج بدە بزانە هیچ درزو کەم و کووڕیەک بەدی دەکەیت؟!

(٤) پاشان هەر سەرنج بدەو چاو بگێڕەو ورد بەرەوە جار لە دوای جارو کۆڵ مەدە، سەرسام و ملکەچ دەبێت، چاوت بە نائومێدی دەگەڕێتەوە لەکاتێکدا کە چاوت ماندووە و پەکی کەوتووە.

(٥) سوێند بەخوا بێگومان ئێمە ئاسمانی دنیامان کردووە بە چراخان (بەهۆی ئەستێرەکانەوە کە بە شەوگاردا بەدی دەکرێن) و بەو ئەستێرانە شەیتانەکان ڕاو دەکەین، لە قیامەتیشدا سزاو ئەشکەنجەی دۆزەخمان بۆ ئامادە کردوون.

(٦) هەروەها بۆ ئەوانەش کە باوەڕیان بە پەروەردگاریان نیە، سزاو ئازاری دۆزەخ ئامادەیە، ئای کە چارەنووس و سەرئەنجامێکی زۆر ناسۆرو ناخۆشە...

(٧) کاتێک فڕێ دەدرێنە ناوی دەنگێکی ناسازو ناخۆش و لوورەیەک لە دۆزەخەوە دەبیستن، لەکاتێکدا قوڵپ دەدات و دەکوڵێت.

(٨) لە داخی خوانەناسان خەریکە پارچە پارچە ببێت و لێک ببێتەوە، هەر جارێک دەستە و تاقمێک فڕێ دەدرێتە ناوی پاسەوانی دۆزەخ لێیان دەپرسێت: باشە، ترسێنەرێکتان بۆ نەهات تا لەم سەرئەنجامە ئاگادارتان بکات؟!

(٩) لە وەڵامدا بەکەساسیەوە دەڵێن: با، بەڵێ، لەڕاستیدا ترسێنەرمان بۆهات، بەڵام ئێمە بڕوامان پێنەکردن و وتمان: خوا هیچی لەم بارەیەوە نەناردووە، ئێوە تەنها لە گومڕاییی گەورەدا گیرتان خواردووە و هیچی تر!!

(١٠) ئینجا دەڵێن: ئەگەر ئێمە گوێمان بگرتایە و بیرو هۆشمان بەکار بهێنایە نەدەبووینە نیشتەجێی دۆزەخ.

(١١) ئەوسا ئیتر بەناچاریی و خەجاڵەتیەوە دان بەگوناهو تاوانی خۆیاندا دەنێن، جا با نیشتەجێکانی دۆزەخ لەوەولاترچن.

(١٢) بەڕاستی ئەوانەی کە لە پەروەردگاریان دەترسن لە پەنهانیدا، بۆ ئەوانە لێخۆشبوون و پاداشتی گەورە ئامادەیە..

وَأَسِرُّوا قَوْلَكُمْ أَوِ ٱجْهَرُوا بِهِۦٓ إِنَّهُۥ عَلِيمٌۢ بِذَاتِ ٱلصُّدُورِ ﴿١٣﴾ أَلَا يَعْلَمُ مَنْ خَلَقَ وَهُوَ ٱللَّطِيفُ ٱلْخَبِيرُ ﴿١٤﴾ هُوَ ٱلَّذِى جَعَلَ لَكُمُ ٱلْأَرْضَ ذَلُولًا فَٱمْشُوا فِى مَنَاكِبِهَا وَكُلُوا مِن رِّزْقِهِۦ وَإِلَيْهِ ٱلنُّشُورُ ﴿١٥﴾ ءَأَمِنتُم مَّن فِى ٱلسَّمَآءِ أَن يَخْسِفَ بِكُمُ ٱلْأَرْضَ فَإِذَا هِىَ تَمُورُ ﴿١٦﴾ أَمْ أَمِنتُم مَّن فِى ٱلسَّمَآءِ أَن يُرْسِلَ عَلَيْكُمْ حَاصِبًا فَسَتَعْلَمُونَ كَيْفَ نَذِيرِ ﴿١٧﴾ وَلَقَدْ كَذَّبَ ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ فَكَيْفَ كَانَ نَكِيرِ ﴿١٨﴾ أَوَلَمْ يَرَوْا إِلَى ٱلطَّيْرِ فَوْقَهُمْ صَٰٓفَّٰتٍ وَيَقْبِضْنَ مَا يُمْسِكُهُنَّ إِلَّا ٱلرَّحْمَٰنُ إِنَّهُۥ بِكُلِّ شَىْءٍۭ بَصِيرٌ ﴿١٩﴾ أَمَّنْ هَٰذَا ٱلَّذِى هُوَ جُندٌ لَّكُمْ يَنصُرُكُم مِّن دُونِ ٱلرَّحْمَٰنِ إِنِ ٱلْكَٰفِرُونَ إِلَّا فِى غُرُورٍ ﴿٢٠﴾ أَمَّنْ هَٰذَا ٱلَّذِى يَرْزُقُكُمْ إِنْ أَمْسَكَ رِزْقَهُۥ بَل لَّجُّوا فِى عُتُوٍّ وَنُفُورٍ ﴿٢١﴾ أَفَمَن يَمْشِى مُكِبًّا عَلَىٰ وَجْهِهِۦٓ أَهْدَىٰٓ أَمَّن يَمْشِى سَوِيًّا عَلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ ﴿٢٢﴾ قُلْ هُوَ ٱلَّذِىٓ أَنشَأَكُمْ وَجَعَلَ لَكُمُ ٱلسَّمْعَ وَٱلْأَبْصَٰرَ وَٱلْأَفْـِٔدَةَ قَلِيلًا مَّا تَشْكُرُونَ ﴿٢٣﴾ قُلْ هُوَ ٱلَّذِى ذَرَأَكُمْ فِى ٱلْأَرْضِ وَإِلَيْهِ تُحْشَرُونَ ﴿٢٤﴾ وَيَقُولُونَ مَتَىٰ هَٰذَا ٱلْوَعْدُ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ ﴿٢٥﴾ قُلْ إِنَّمَا ٱلْعِلْمُ عِندَ ٱللَّهِ وَإِنَّمَآ أَنَا۠ نَذِيرٌ مُّبِينٌ ﴿٢٦﴾

(١٣) خەڵکینە؛ چونیەکە بۆتان چ بەنهێنی قسە بکەن یان بەئاشکرا، ئەوزاتە بەهەموو ئەو خەتەرەو خەیالانەی دێن بەکرۆکی سینەکاندا زاناو ئاگایە.

(١٤) مەگەر خوا نازانێت کێی دروست کردووە و چۆنی دروست کردووە، لەکاتێکدا ئەو زاتە وردکارو بە سۆزو ئاگایە.

(١٥) هەر ئەو زاتە زەوی بۆ زەلیل و ملکەچ کردوون (هەرچیتان بوێت لەسەری دروست دەکەن، چۆنتان بوێت بەکاری دەهێنن)، بگەڕێن بە هەموو گۆشە و کەناریدا، لەو رزق و رۆزیەش بخۆن کە پێشکەشتانی دەکات، دڵنیاش بن کە سەرئەنجام گەڕانەوەتان بۆ لای ئەو زاتەیە.

(١٦) ئایا لەو زاتە ناترسن کە لە سەرووی ئاسمانەوەیە، کە بەناخی زەویدا بتانباتە خوارەوە؟! جا دەستبەجێ ئەو زەوییە بێتە لەرزە ...

(١٧) یاخود لەو زاتە ناترسن کە لە سەروو ئاسماندایە کە بایەکی بەهێز هەڵکاتە سەرتان و بەرد بارانتان بکات؟! ئەوسا دەزانن هەڕەشەی من چۆن بووە.

(١٨) سوێند بەخوا بێگومان خەڵکانی تری پێش ئەمان بروایان بەپێغەمبەرانی ئێمە نەکرد ئاشکرایە چ بەلایەکم بەسەرهێنان و چۆن تەمێم کردن.

(١٩) ئایا سەرنجی باڵندەیان نەداوە بەسەریانەوە پۆل پۆل دەفڕن و باڵەکانیان لێک دەنێن، ئەو باڵندانە جگە خوای میهرەبان کەس بە ئاسمانەوە ڕاگیریان ناکات، بەڕاستی ئەو زاتە بە هەموو شتێک بینایە و هیچی لیٚ ون نابێت و چاودێری هەموو دروستکراوانی دەکات (فڕۆکە و کەشتی ئاسمانی و ...هتد، هەر ئەو زاتە بە هۆکارەکان لە ئاسماندا هاتووچۆیان پێدەکات و رایان دەگرێت).

(٢٠) ئایا کێیە ئەو کەسە خۆی بەسەربازو بەرگریکەر لە ئێوە دەزانێت و وا دەنوێنێت کە دەتوانێت بەبێ خوای میهرەبان سەرتان بخات و پایەدارتان بکات؟! نەخێر، کافران تەنها لە خەڵەتاویدان و هیچی تر؟!

(٢١) یاخود کێیە ئەوەی کە رزق و رۆزیتان پێدەبەخشێت، ئەگەر خوا لێتان بگرێتەوە؟! نەخێر، بەو تاقی کردنەوەیەش بێباوەڕان هەر لە گومڕایی و سەرلێشێواوی و دوورە پەرێزی لە بەرنامەی خوا رۆچوون!

(٢٢) جا ئایا ئەو کەسەی کە دەمەو ڕوو کەوتووەو بەو حاڵەوە دەڕوات، چاکتر ڕێگە دەزانێت؟ یان ئەو کەسەی کە بەسەر شەقامێکی ڕاست و ڕەواندا بە ڕێک و پێکی دەڕوات بەڕێوە؟!

(٢٣) ئەی پێغەمبەر ﷺ پێیان بڵێ: هەر خوایە، کە ئێوەی دروستکردووە و دەزگای بینین و بیستن و تێگەیشتنی پێبەخشیون، کەچی کەمتان شوکرانە بژێر و سوپاسگوزارن.

(٢٤) هەروەها پێیان بڵێ: هەر ئەو خوایە؛ ئێوەی لە خاکی زەوی پێگەیاندووە، گەڕانەوە و کۆکردنەوەشتان بۆ لای ئەوە.

(٢٥) بێباوەڕان دەڵێن: باشە، کەی ئەم بەڵێنە دێتە دی، (زیندووکردنەوە و لێپرسینەوە) ئەگەر ئێوە ڕاستگۆن؟!

(٢٦) پێیان بڵێ: زانیاری ئەو کاتە لای خوایە، من تەنها بێدارکەرەوەیەکی ئاشکرام.

فَلَمَّا رَأَوْهُ زُلْفَةً سِيٓـَٔتْ وُجُوهُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ وَقِيلَ هَٰذَا ٱلَّذِى كُنتُم بِهِۦ تَدَّعُونَ ﴿٢٧﴾ قُلْ أَرَءَيْتُمْ إِنْ أَهْلَكَنِىَ ٱللَّهُ وَمَن مَّعِىَ أَوْ رَحِمَنَا فَمَن يُجِيرُ ٱلْكَٰفِرِينَ مِنْ عَذَابٍ أَلِيمٍ ﴿٢٨﴾ قُلْ هُوَ ٱلرَّحْمَٰنُ ءَامَنَّا بِهِۦ وَعَلَيْهِ تَوَكَّلْنَا فَسَتَعْلَمُونَ مَنْ هُوَ فِى ضَلَٰلٍ مُّبِينٍ ﴿٢٩﴾ قُلْ أَرَءَيْتُمْ إِنْ أَصْبَحَ مَآؤُكُمْ غَوْرًا فَمَن يَأْتِيكُم بِمَآءٍ مَّعِينٍۭ ﴿٣٠﴾

سُورَةُ القَلَمِ

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

نٓ وَٱلْقَلَمِ وَمَا يَسْطُرُونَ ﴿١﴾ مَآ أَنتَ بِنِعْمَةِ رَبِّكَ بِمَجْنُونٍ ﴿٢﴾ وَإِنَّ لَكَ لَأَجْرًا غَيْرَ مَمْنُونٍ ﴿٣﴾ وَإِنَّكَ لَعَلَىٰ خُلُقٍ عَظِيمٍ ﴿٤﴾ فَسَتُبْصِرُ وَيُبْصِرُونَ ﴿٥﴾ بِأَييِّكُمُ ٱلْمَفْتُونُ ﴿٦﴾ إِنَّ رَبَّكَ هُوَ أَعْلَمُ بِمَن ضَلَّ عَن سَبِيلِهِۦ وَهُوَ أَعْلَمُ بِٱلْمُهْتَدِينَ ﴿٧﴾ فَلَا تُطِعِ ٱلْمُكَذِّبِينَ ﴿٨﴾ وَدُّوا۟ لَوْ تُدْهِنُ فَيُدْهِنُونَ ﴿٩﴾ وَلَا تُطِعْ كُلَّ حَلَّافٍ مَّهِينٍ ﴿١٠﴾ هَمَّازٍ مَّشَّآءٍۭ بِنَمِيمٍ ﴿١١﴾ مَّنَّاعٍ لِّلْخَيْرِ مُعْتَدٍ أَثِيمٍ ﴿١٢﴾ عُتُلٍّۭ بَعْدَ ذَٰلِكَ زَنِيمٍ ﴿١٣﴾ أَن كَانَ ذَا مَالٍ وَبَنِينَ ﴿١٤﴾ إِذَا تُتْلَىٰ عَلَيْهِ ءَايَٰتُنَا قَالَ أَسَٰطِيرُ ٱلْأَوَّلِينَ ﴿١٥﴾

الحزب ٥٧

(٢٧) کاتێک بینیان ئەو بەڵێنە خوایییە بەخەیان پێ دەگرێت، چرووچاوی ئەوانەی کە باوەڕیان نەبووە، تاڵ و ترش و ناشرین دەکرێت، ئەوسا پێیان دەوترێت ئا ئەمە ئەو بەڵێنەیە کە پێتان دەدرا.

(٢٨) هەروەها پێیان بڵێ: باشە، ئەگەر خوا، من و هەموو ئەو کەسانەی کە شوێنم کەوتوون لەناو بەرێت، یان بەزەیی پیاماندا بێتەوە، ئەوسا کێ هەیە بێباوەڕان لە سزای پڕ ئێشی دۆزەخ رزگار بکات؟! (ئەگەر لەسەر یاخیبوونیان بەردەوام بن)

(٢٩) هەروەها بڵێ: ئێمە خوای میهرەبانمان هەیەو باوەڕی بتەومان پێیەتی و پشت و پەنامان هەر ئەوە، جا ئیتر رۆژێک دێت کە بە روونی بۆتان دەردەکەوێت کێ لە گومڕایی ئاشکرادا گیری خواردووە و سەری لێ شێواوە.

(٣٠) پێیان بڵێ: هەواڵم بدەنێ باشە ئەگەر ئاوەکەتان رۆچوو، کێ دەتوانێت ئاوی سازگارو رەوانتان بۆ بەدەست بهێنێت؟! (جگە لە خوای میهرەبان).

سوورەتی (القـلـم)

بەناوی خوای بەخشندە و میهرەبان

(١) سەرنجی سەرەتای سوورەتی (الشورى) بدە.

(٢) سوێند بە پێنووس و ئەوەی کە دەینوسن (ئەم سوێند خواردنە نیشانەی نرخی خوێندن و زانستیە لای خوای گەورە).

(٢) ئەی پێغەمبەر ﷺ تۆ بەهۆی نازو نیعمەتی پەروەردگارتەوە دووریت لە شێتییەوە (وەکو نەفامان دەڵێن).

(٣) بێگومان پاداشتێکی نەبڕاوە بۆ تۆ ئامادەیە.

(٤) بەڕاستی تۆ لەسەر رەوشت و خوویەکی زۆر جوان و پەسەند و بێ وێنە و مەزنیت.

(٥) سەرئەنجام تۆ دەبینیت و دەزانیت و ئەوانیش دەبینن و دەزانن...

(٦) شێتێتی بە کامتانەوەیە.

(٧) بەڕاستی پەروەردگارت خۆی دەزانێت، کێ لە ڕێبازی ئەو لایداوە و گومڕا بووە، کێیش ڕێبازی هیدایەت و ئیمانی گرتۆتەبەر و ڕاستە لەگەڵ خوادا.

(٨) تۆ هەرگیز بەقسەی ئەوانە مەکە کە باوەڕیان بە تۆ نیە و بەرنامەکەی تۆ بەدرۆدەزانن.

(٩) ئەوانە ئاواتەخوازن کە تۆ نەرمی بنوێنیت ئینجا ئەوانیش نەرمی بنوێنن.

(١٠) بەقسەی هەموو ئەوانە مەکە کە زۆر سوێند دەخۆن و زۆر سووک و ریسوان ...

(١١) ئەوانەی کە بە شوێن عەیب و عاردا دەگەڕێن و دووزمانی دەکەن و فیتنە دەگێڕن و حەزیان لە ئاشووبە.

(١٢) زۆر دژی خێرو چاکەن و دەستدرێژی دەکەن و گوناهـ ئەنجام دەدەن و پیلان دەگێڕن.

(١٣) لەهەمان کاتدا ئێسک تاڵ و رەوشت ناشرین و ناکەس بەچەو باوک نادیارن ...

(١٤) هەریەکەیان بەوە دەنازێت کە هەندێک ماڵ و سامان و کوڕی هەیە...

(١٥) کاتێک ئایەتەکانی ئێمەی بەسەردا دەخوێنرێتەوە بێباکانە دەڵێت: ئەمە داستانی پێشووەکانە، ئەمە بەسەرهاتی دێرینە.

سَنَسِمُهُۥ عَلَى ٱلْخُرْطُومِ ﴿١٦﴾ إِنَّا بَلَوْنَٰهُمْ كَمَا بَلَوْنَآ أَصْحَٰبَ ٱلْجَنَّةِ إِذْ أَقْسَمُوا۟ لَيَصْرِمُنَّهَا مُصْبِحِينَ ﴿١٧﴾ وَلَا يَسْتَثْنُونَ ﴿١٨﴾ فَطَافَ عَلَيْهَا طَآئِفٌ مِّن رَّبِّكَ وَهُمْ نَآئِمُونَ ﴿١٩﴾ فَأَصْبَحَتْ كَٱلصَّرِيمِ ﴿٢٠﴾ فَتَنَادَوْا۟ مُصْبِحِينَ ﴿٢١﴾ أَنِ ٱغْدُوا۟ عَلَىٰ حَرْثِكُمْ إِن كُنتُمْ صَٰرِمِينَ ﴿٢٢﴾ فَٱنطَلَقُوا۟ وَهُمْ يَتَخَٰفَتُونَ ﴿٢٣﴾ أَن لَّا يَدْخُلَنَّهَا ٱلْيَوْمَ عَلَيْكُم مِّسْكِينٌ ﴿٢٤﴾ وَغَدَوْا۟ عَلَىٰ حَرْدٍ قَٰدِرِينَ ﴿٢٥﴾ فَلَمَّا رَأَوْهَا قَالُوٓا۟ إِنَّا لَضَآلُّونَ ﴿٢٦﴾ بَلْ نَحْنُ مَحْرُومُونَ ﴿٢٧﴾ قَالَ أَوْسَطُهُمْ أَلَمْ أَقُل لَّكُمْ لَوْلَا تُسَبِّحُونَ ﴿٢٨﴾ قَالُوا۟ سُبْحَٰنَ رَبِّنَآ إِنَّا كُنَّا ظَٰلِمِينَ ﴿٢٩﴾ فَأَقْبَلَ بَعْضُهُمْ عَلَىٰ بَعْضٍ يَتَلَٰوَمُونَ ﴿٣٠﴾ قَالُوا۟ يَٰوَيْلَنَآ إِنَّا كُنَّا طَٰغِينَ ﴿٣١﴾ عَسَىٰ رَبُّنَآ أَن يُبْدِلَنَا خَيْرًا مِّنْهَآ إِنَّآ إِلَىٰ رَبِّنَا رَٰغِبُونَ ﴿٣٢﴾ كَذَٰلِكَ ٱلْعَذَابُ ۖ وَلَعَذَابُ ٱلْءَاخِرَةِ أَكْبَرُ ۚ لَوْ كَانُوا۟ يَعْلَمُونَ ﴿٣٣﴾ إِنَّ لِلْمُتَّقِينَ عِندَ رَبِّهِمْ جَنَّٰتِ ٱلنَّعِيمِ ﴿٣٤﴾ أَفَنَجْعَلُ ٱلْمُسْلِمِينَ كَٱلْمُجْرِمِينَ ﴿٣٥﴾ مَا لَكُمْ كَيْفَ تَحْكُمُونَ ﴿٣٦﴾ أَمْ لَكُمْ كِتَٰبٌ فِيهِ تَدْرُسُونَ ﴿٣٧﴾ إِنَّ لَكُمْ فِيهِ لَمَا تَخَيَّرُونَ ﴿٣٨﴾ أَمْ لَكُمْ أَيْمَٰنٌ عَلَيْنَا بَٰلِغَةٌ إِلَىٰ يَوْمِ ٱلْقِيَٰمَةِ ۙ إِنَّ لَكُمْ لَمَا تَحْكُمُونَ ﴿٣٩﴾ سَلْهُمْ أَيُّهُم بِذَٰلِكَ زَعِيمٌ ﴿٤٠﴾ أَمْ لَهُمْ شُرَكَآءُ فَلْيَأْتُوا۟ بِشُرَكَآئِهِمْ إِن كَانُوا۟ صَٰدِقِينَ ﴿٤١﴾ يَوْمَ يُكْشَفُ عَن سَاقٍ وَيُدْعَوْنَ إِلَى ٱلسُّجُودِ فَلَا يَسْتَطِيعُونَ ﴿٤٢﴾

(١٦) ئێمە سەرئەنجام لووتی داخ دەکەین و سەری لووتی رەش دەکەین.

(١٧) بەراستی ئێمە ئەو خەڵکەمان تاقی کردەوە هەروەک خاوەنانی باخەکەمان تاقیکردەوە، کاتێک سوێندیان خوارد بێگومان بەیانی دەیچنن (١٨) بێ ئەوەی بڵێن بەپشتیوانی خوا، (یان بەو مەبەستەی هیچی پێوە نەهێڵن بۆ هەژاران)...

(١٩) ئەوسا پەروەردگارت بەڵایەکی داباراند بەسەر باخەکەدا لەکاتێکدا ئەوان خەوتبوون...

(٢٠) ئیتر وەک باخێکی لێهات؛ کە هەمووی چنرابێتەوە و هیچی پێوە نەما بێت...

(٢١) ئەوسا بەیانی زوو یەکتریان ئاگادار کرد و وتیان:...

(٢٢) با بچین بۆ سەر باخ و بێستانەکەمان ئەگەر بڕیارە بیچنین...

(٢٣) ئەوسا دەرچوون بەنهێنی و بەهێواشی دەڕۆیشتن، بە چپە قسەیان دەکرد...

(٢٤) دەیانوت: نابێت ئەمڕۆ هەژاران پێمان بزانن و روو بکەنە باخەکەمان...

(٢٥) بەیانی زوو بۆی دەرچوون، وایان دەزانی کە توانیویانە هەژاران بێبەش بکەن.

(٢٦) کاتێک گەیشتنە باخە وێرانەکە و بینیان وتیان: بێگومان ئێمە ون بووین و رێمان هەڵە کردووە...

(٢٧) دوای ئەوەی دڵنیا بوون رێیان هەڵە نەکردوە، وتیان: نەخێر، بەڵکو ئێمە بەش بڕاو کراوین...

(٢٨) لە هەموویان ژیرتر وتی: پێم نەوتن کە حەق وایە تەسبیحات و ستایشی خوا بکەن و سوپاسگوزاری بکەن؟!

(٢٩) ئەوسا هەموو وتیان: پاکی و بێگەردی بۆ پەروەردگارمانە، بەڕاستی ئێمە ناحەقیمان کرد.

(٣٠) ئەوسا رویان کردە یەکترو دەستیان کردە لۆمەکردن و سەرزەنشت کردنی یەکتری و...

(٣١) وتیان: هاوار بۆ ئێمە، بەراستی ئێمە پیاو خراپ و لە سنوور دەرچوو بووین (کەی ئەو ڕەزیلییە راستە)!!

(٣٢) ئومێدەوارین کە پەروەردگارمان لەم باخە باشترمان پێ ببەخشێت (ئێمە ئیتر تەمێ بووین، دەرس و ئامۆژگاریمان وەرگرت) ئیتر ئێمە بەراستی بەهیوای رەزامەندی خوا هەوڵ دەدەین و بەهیوای بەخششی ئەوین.

(٣٣) سزای ئەم ژیانە ئاوایە و سزاو ئازاری قیامەتیش سەختترە ئەگەر خەڵکی بیانزانیایە.

(٣٤) بەڕاستی بۆ خواناس و پارێزکاران باخەکانی بەهەشتی پڕ لە ئازو نیعمەت لەلای پەروەردگاریان ئامادەیە.

(٣٥) ئایا رەوایە پاداشتی موسڵمانان وەک تاوانبار و تاوانکاران بێت؟!

(٣٦) ئەوە چیتانە؟ چۆن حوکم و بڕیاری نارەوای وا دەردەکەن!!

(٣٧) ئایا کتێبێکی ئاسمانیتان بۆ هاتووە، تیایدا بخوێنن؟!...

(٣٨) تا هەرچی ئێوە بتانەوێت بە ئارەزووی خۆتان هەڵیبژێرن؟!

(٣٩) یان سوێندتان لەسەرمانە کەتا رۆژی قیامەت هەر چیتان بوێت ئەوە بێت؟!

(٤٠) پرسیاریان لێ بکە بزانە کامیان زامنی ئەو کارەیە!!

(٤١) ئایا ئەمانە شەریک و هاوبەشیان هەیە لەم بڕیارەدا، کوان؟ دەبا بیانهێنن ئەگەر راست دەکەن؟

(٤٢) رۆژێک دێت پەردە لەسەر هەموو شتێک لادەدرێت و لاق دەردەکەوێت، خوانەناسان بانگ دەکرێن بۆ سوژدە بردن، بەڵام ناتوانن.

خَٰشِعَةً أَبْصَٰرُهُمْ تَرْهَقُهُمْ ذِلَّةٌ ۖ وَقَدْ كَانُوا۟ يُدْعَوْنَ إِلَى ٱلسُّجُودِ وَهُمْ سَٰلِمُونَ ﴿٤٣﴾ فَذَرْنِى وَمَن يُكَذِّبُ بِهَٰذَا ٱلْحَدِيثِ ۖ سَنَسْتَدْرِجُهُم مِّنْ حَيْثُ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٤٤﴾ وَأُمْلِى لَهُمْ ۚ إِنَّ كَيْدِى مَتِينٌ ﴿٤٥﴾ أَمْ تَسْـَٔلُهُمْ أَجْرًا فَهُم مِّن مَّغْرَمٍ مُّثْقَلُونَ ﴿٤٦﴾ أَمْ عِندَهُمُ ٱلْغَيْبُ فَهُمْ يَكْتُبُونَ ﴿٤٧﴾ فَٱصْبِرْ لِحُكْمِ رَبِّكَ وَلَا تَكُن كَصَاحِبِ ٱلْحُوتِ إِذْ نَادَىٰ وَهُوَ مَكْظُومٌ ﴿٤٨﴾ لَّوْلَآ أَن تَدَٰرَكَهُۥ نِعْمَةٌ مِّن رَّبِّهِۦ لَنُبِذَ بِٱلْعَرَآءِ وَهُوَ مَذْمُومٌ ﴿٤٩﴾ فَٱجْتَبَٰهُ رَبُّهُۥ فَجَعَلَهُۥ مِنَ ٱلصَّٰلِحِينَ ﴿٥٠﴾ وَإِن يَكَادُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ لَيُزْلِقُونَكَ بِأَبْصَٰرِهِمْ لَمَّا سَمِعُوا۟ ٱلذِّكْرَ وَيَقُولُونَ إِنَّهُۥ لَمَجْنُونٌ ﴿٥١﴾ وَمَا هُوَ إِلَّا ذِكْرٌ لِّلْعَٰلَمِينَ ﴿٥٢﴾

سُورَةُ الحَاقَّة

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ



ٱلْحَآقَّةُ ﴿١﴾ مَا ٱلْحَآقَّةُ ﴿٢﴾ وَمَآ أَدْرَىٰكَ مَا ٱلْحَآقَّةُ ﴿٣﴾ كَذَّبَتْ ثَمُودُ وَعَادٌۢ بِٱلْقَارِعَةِ ﴿٤﴾ فَأَمَّا ثَمُودُ فَأُهْلِكُوا۟ بِٱلطَّاغِيَةِ ﴿٥﴾ وَأَمَّا عَادٌ فَأُهْلِكُوا۟ بِرِيحٍ صَرْصَرٍ عَاتِيَةٍ ﴿٦﴾ سَخَّرَهَا عَلَيْهِمْ سَبْعَ لَيَالٍ وَثَمَٰنِيَةَ أَيَّامٍ حُسُومًا فَتَرَى ٱلْقَوْمَ فِيهَا صَرْعَىٰ كَأَنَّهُمْ أَعْجَازُ نَخْلٍ خَاوِيَةٍ ﴿٧﴾ فَهَلْ تَرَىٰ لَهُم مِّنۢ بَاقِيَةٍ ﴿٨﴾

(٤٣) ئەوانە؛ ئەو رۆژە چاویان شۆڕە و زەلیلی و خەجالەتی بەتەواوی دایان دەگرێت، چونکە کاتی خۆی بانگ دەکران بۆ نوێژکردن و سوژدە بردن، لە کاتێکدا لەوپەڕی تەندروستی و سەربەستیدا بوون (بەلام گالتەیان پێی دەهات).

(٤٤) وازم لێ بهێنە بۆ ئەوانەوی کە بڕوا بەم گوفتارە ناهێنن، ئێمە ئەوانە بۆ سەرەنجامی ناکامیان بەرەبەرە کێش دەکەین، بێ ئەوەی بە خۆیان بزانن و هەستی پێ بکەن.

(٤٥) من مۆڵەتیان دەدەم، بەلام هەرگیز لە سزای ئێمە رزگاریان نابێت چونکە بێگومان دەسەلاتمان تۆکمەیە.

(٤٦) ئەی ئایا تۆ داوای کرێیان لێدەکەیت، تا قەرزار باری زۆر ببن و نەتوانن لە ژێری دەرچن؟!

(٤٧) ئەی ئایا ئەوانە غەیب زانن و لە نهێنیەکان ئاگادارن، تا بۆ خۆیان شت یاداشت بکەن و دژایەتی ئیسلام بکەن؟

(٤٨) ئەی پێغەمبەر ﷺ تۆ خۆڕاگربە لە بەرامبەر فەرمانی پەروەردگارتەوە، نەکەیت وەک هاوەڵ و خاوەنی نەهەنگەکە بیت (کە یونس پێغەمبەرە) لە کاتێکدا کە دڵی پڕ بوو لە خەفەت و پەژارەیەکی زۆرەوە پاڕایەوە و لالایەوە...

(٤٩) ئەگەر رەحمەت و بەخشندەیی پەروەردگاری فریای نەکەوتایە هەروا لەو دەشتەدا بەبێ ناز دەمایەوە...

(٥٠) بەلام پەروەردگاری هەڵی بژاردو خستیە ریزی چاکانەوە (دوای نزاو پەشیمانی).

(٥١) (ئەی پێغەمبەر ﷺ) بەڕاستی ئەوانەی کە بێباوەڕ بوون کاتێک کە گوێیان لە قورئان دەبێت نزیکە بە چاویان هەڵتدێرن، دەڵێن: ئەم پێغەمبەرە دەستی لێ وەشێنراوە.

(٥٢) لەکاتێکدا قورئان تەنها بریتیە لە یادخستنەوە و بێدارخەرەوەی هەموو خەڵکی ئەم جیهانە (ئەگەر تێفکرن).

## سوورەتی (الحاقـة)

بەناوی خوای بەخشندە و میهرەبان

(١) یەکێکە لە ناوەکانی رۆژی قیامەت ئەوە دەگەیەنێت کە لەو رۆژەدا خوای گەورە حەق و راستی بەتەواوی دەچەسپێنێت.

(٢) (ئینجا پرسیار دەکات و زیاتر گرنگی ئەو رۆژە دەخاتە بەرچاو) چی بێ ئەو رۆژە؟!

(٣) جا تۆ چووزانی ئەی پێغەمبەر ﷺ ئەی ئادەمیزاد، ئەو رۆژە چیە و چۆنە و چ تەنگانەیەکە؟

(٤) ثمود قەومی صالح، عاد قەومی هود ئەو رۆژەیان بە درۆزانی.

(٥) ئینجا گەلی ثمودمان بەدەنگێکی سامناکی گەورەی تۆقێنەر لەناوبران.

(٦) گەلی عادیش بەرەشەبایەکی ساردی بەهێزی وێرانگەر لەناوبران.

(٧) حەوت شەوو هەشت رۆژ هەڵیکردە سەریان، بەردەوام و بەهێز دەتبینی (ئەگەر لەوێ بویتایە) ئەو خەڵکە هەموو لاڵ و پاڵ لێی دەکەوتن هەروەک قەدی دارخورمای لە ریشە هەڵکەنراو، چۆن بەئاسانی دەکەوێت و شەق دەبات.

(٨) جا ئایا دەبینیت کەسیان مابێت و کەسیان رزگاری بووبێت؟!

وَجَآءَ فِرۡعَوۡنُ وَمَن قَبۡلَهُۥ وَٱلۡمُؤۡتَفِكَٰتُ بِٱلۡخَاطِئَةِ ﴿٩﴾ فَعَصَوۡاْ رَسُولَ
رَبِّهِمۡ فَأَخَذَهُمۡ أَخۡذَةٗ رَّابِيَةً ﴿١٠﴾ إِنَّا لَمَّا طَغَا ٱلۡمَآءُ حَمَلۡنَٰكُمۡ فِي ٱلۡجَارِيَةِ
﴿١١﴾ لِنَجۡعَلَهَا لَكُمۡ تَذۡكِرَةٗ وَتَعِيَهَآ أُذُنٞ وَٰعِيَةٞ ﴿١٢﴾ فَإِذَا نُفِخَ فِي ٱلصُّورِ
نَفۡخَةٞ وَٰحِدَةٞ ﴿١٣﴾ وَحُمِلَتِ ٱلۡأَرۡضُ وَٱلۡجِبَالُ فَدُكَّتَا دَكَّةٗ وَٰحِدَةٗ ﴿١٤﴾
فَيَوۡمَئِذٖ وَقَعَتِ ٱلۡوَاقِعَةُ ﴿١٥﴾ وَٱنشَقَّتِ ٱلسَّمَآءُ فَهِيَ يَوۡمَئِذٖ وَاهِيَةٞ
﴿١٦﴾ وَٱلۡمَلَكُ عَلَىٰٓ أَرۡجَآئِهَاۚ وَيَحۡمِلُ عَرۡشَ رَبِّكَ فَوۡقَهُمۡ يَوۡمَئِذٖ ثَمَٰنِيَةٞ
﴿١٧﴾ يَوۡمَئِذٖ تُعۡرَضُونَ لَا تَخۡفَىٰ مِنكُمۡ خَافِيَةٞ ﴿١٨﴾ فَأَمَّا مَنۡ أُوتِيَ
كِتَٰبَهُۥ بِيَمِينِهِۦ فَيَقُولُ هَآؤُمُ ٱقۡرَءُواْ كِتَٰبِيَهۡ ﴿١٩﴾ إِنِّي ظَنَنتُ أَنِّي مُلَٰقٍ
حِسَابِيَهۡ ﴿٢٠﴾ فَهُوَ فِي عِيشَةٖ رَّاضِيَةٖ ﴿٢١﴾ فِي جَنَّةٍ عَالِيَةٖ ﴿٢٢﴾
قُطُوفُهَا دَانِيَةٞ ﴿٢٣﴾ كُلُواْ وَٱشۡرَبُواْ هَنِيٓـَٔۢا بِمَآ أَسۡلَفۡتُمۡ فِي ٱلۡأَيَّامِ
ٱلۡخَالِيَةِ ﴿٢٤﴾ وَأَمَّا مَنۡ أُوتِيَ كِتَٰبَهُۥ بِشِمَالِهِۦ فَيَقُولُ يَٰلَيۡتَنِي لَمۡ أُوتَ كِتَٰبِيَهۡ
﴿٢٥﴾ وَلَمۡ أَدۡرِ مَا حِسَابِيَهۡ ﴿٢٦﴾ يَٰلَيۡتَهَا كَانَتِ ٱلۡقَاضِيَةَ ﴿٢٧﴾ مَآ أَغۡنَىٰ
عَنِّي مَالِيَهۡۜ ﴿٢٨﴾ هَلَكَ عَنِّي سُلۡطَٰنِيَهۡ ﴿٢٩﴾ خُذُوهُ فَغُلُّوهُ ﴿٣٠﴾ ثُمَّ ٱلۡجَحِيمَ
صَلُّوهُ ﴿٣١﴾ ثُمَّ فِي سِلۡسِلَةٖ ذَرۡعُهَا سَبۡعُونَ ذِرَاعٗا فَٱسۡلُكُوهُ ﴿٣٢﴾ إِنَّهُۥ
كَانَ لَا يُؤۡمِنُ بِٱللَّهِ ٱلۡعَظِيمِ ﴿٣٣﴾ وَلَا يَحُضُّ عَلَىٰ طَعَامِ ٱلۡمِسۡكِينِ ﴿٣٤﴾

سكتة لطيفة في مالية

(٩) فیرعەون و ئەوانەی پێش ئەویش و دانیشتوانی دێهاتە ژێرەو ژوور بووەکان، بە تاوان و خراپەوە هاتن.

(١٠) هەریەکێک لەوانە سەرپێچی و سەرکەشییان نواند بەرامبەر پێغەمبەری پەروەردگاریان ئەوسا گرتنی بەگرتنێکی سەخت.

(١١) بەراستی ئێمە کاتێک ئاو لە سنوور دەرچوو (لە کاتی تۆفانەکەی نوح دا) ئێوەمان لە کەشتیدا هەڵگرت(باو و باپیرانی ئێوە).

(١٢) تا بیکەینە یادگاری و بێدارکەرەوە بۆ ئێوە و لەگوێی بگرێت ئەو گوێیانەی هۆشمەندن.

(١٣) ئینجا کاتێک یەکجار فووکرا بە صووردا.

(١٤) زەوی و کێوەکان هەڵگیران و یەککەرەت دران بەیەکدا.

(١٥) لەو ڕۆژەدا ئیتر قیامەت بەرپا دەبێت.

(١٦) ئاسمان هەمووی شەق و پەق دەبێت و لێک دەترازێت و شل و شۆڵ دەبێت.

(١٧) فریشتەکان لەگۆشە و کەناری(جیهانی نوێ) دا ئامادە دەبن، تەختی پەروەردگارت ئەو ڕۆژە هەشت هەڵی دەگرێت (هەشت فریشتە یان هەشت دەستە) بەسەر سەریانەوە .

(١٨) لەو ڕۆژەدا پیشان دەدرێن، هیچ شتێک لە نهێنیەکانتان شاراوە نییە.

(١٩) جا ئەوەی نامەی کردەوەکانی درایە دەستی ڕاستی، ئەوە (بەدڵخۆشیەکی بێسنوورەوە بە هاوەڵ و ناسیاوانی) دەڵێت: ها ئەوەتا نامەی کردەوەکانم بیگرن و بخوێننەوە و تەماشای بکەن.

(٢٠) بەراستی من کاتی خۆی سوور دەمزانی و دڵنیابووم کە بەم لێپرسینەوە دەگەم!!

(٢١) جا ئەو بەختەوەرە لە ژیانێکی پڕ لە شادی و کامەرانیدا دەژی کە زۆر پێی ڕازیە...

(٢٢) لە بەهەشتی بەرزو بڵندا، (لە باخچەکانی سەر لوتکەی چیاو لاپاڵی شاخەکاندا لەناو کۆشک و تەلارەکاندا).

(٢٣) میوەهاتی زۆر بە درەختەکانیەوە شۆڕ بۆتەوە و لێکردنەوەی ئاسانە و لە دەست ڕەس دایە.

(٢٤) ئینجا پێیان دەوترێت: بخۆن و بخۆنەوە نۆشتان بێت، بەهۆی دەست پێشکەریتان لە ڕۆژگاری ڕابوردودا.

(٢٥) بەڵام ئەوەی نامەی کردەوەکانی دەدرێتە دەستی چەپی، ئەوە دەڵێت: خۆزگە نامەی کردەوەکانم پێ نەدرایە.

(٢٦) هەر نەمزانیایە لێپرسینەوەم چۆن دەبێت.

(٢٧) خۆزگە مردنەکەم یەکجاریی بوایە (ئاوا زیندوو نەکرامایەتەوە).

(٢٨) ئەوەتە، ئەو ماڵ و سامانەی کە بووم، فریام نەکەوت (بەڵکو نەماو تەفر و تونا بوو).

(٢٩) ئەو دەسەڵاتەی کە بووم لە دەستمدا نەماو لە دەستم چوو.

(٣٠) (ئەوسا ئیتر فەرمان دەدرێت) نادەی ئێوە بیگرن و کۆت و زنجیر لە دەست و قاچ و ملی بئاڵێنن.

(٣١) لەوەودوا بەرەو دۆزەخ ڕاپێچی بکەن و بیبەن و بیخەنە ناوی.

(٣٢) پاشان بەزنجیرێکی حەفتا گەزی بیبەسنەوە (بەکۆڵەکە و ستون و پایەکانی ناو دۆزەخەوە).

(٣٣) چونکە بەراستی ئەمە کاتی خۆی ئیمان و باوەڕی بەخوای گەورە نەبوو (بە تەمای زیندوبوونەوە و لێپرسینەوە نەبوو).

(٣٤) هانی کەسی نەدەدا کە خواردن و خۆراک ببەخشن بە هەژارو بێ نەواکان (بەڵکو هەر خەمی خۆی بوو).

فَلَيْسَ لَهُ الْيَوْمَ هَاهُنَا حَمِيمٌ ﴿٣٥﴾ وَلَا طَعَامٌ إِلَّا مِنْ غِسْلِينٍ ﴿٣٦﴾ لَا يَأْكُلُهُ إِلَّا الْخَاطِئُونَ ﴿٣٧﴾ فَلَا أُقْسِمُ بِمَا تُبْصِرُونَ ﴿٣٨﴾ وَمَا لَا تُبْصِرُونَ ﴿٣٩﴾ إِنَّهُ لَقَوْلُ رَسُولٍ كَرِيمٍ ﴿٤٠﴾ وَمَا هُوَ بِقَوْلِ شَاعِرٍ قَلِيلًا مَا تُؤْمِنُونَ ﴿٤١﴾ وَلَا بِقَوْلِ كَاهِنٍ قَلِيلًا مَا تَذَكَّرُونَ ﴿٤٢﴾ تَنْزِيلٌ مِنْ رَبِّ الْعَالَمِينَ ﴿٤٣﴾ وَلَوْ تَقَوَّلَ عَلَيْنَا بَعْضَ الْأَقَاوِيلِ ﴿٤٤﴾ لَأَخَذْنَا مِنْهُ بِالْيَمِينِ ﴿٤٥﴾ ثُمَّ لَقَطَعْنَا مِنْهُ الْوَتِينَ ﴿٤٦﴾ فَمَا مِنْكُمْ مِنْ أَحَدٍ عَنْهُ حَاجِزِينَ ﴿٤٧﴾ وَإِنَّهُ لَتَذْكِرَةٌ لِلْمُتَّقِينَ ﴿٤٨﴾ وَإِنَّا لَنَعْلَمُ أَنَّ مِنْكُمْ مُكَذِّبِينَ ﴿٤٩﴾ وَإِنَّهُ لَحَسْرَةٌ عَلَى الْكَافِرِينَ ﴿٥٠﴾ وَإِنَّهُ لَحَقُّ الْيَقِينِ ﴿٥١﴾ فَسَبِّحْ بِاسْمِ رَبِّكَ الْعَظِيمِ ﴿٥٢﴾

سُورَةُ المَعَارِج

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

سَأَلَ سَائِلٌ بِعَذَابٍ وَاقِعٍ ﴿١﴾ لِلْكَافِرِينَ لَيْسَ لَهُ دَافِعٌ ﴿٢﴾ مِنَ اللَّهِ ذِي الْمَعَارِجِ ﴿٣﴾ تَعْرُجُ الْمَلَائِكَةُ وَالرُّوحُ إِلَيْهِ فِي يَوْمٍ كَانَ مِقْدَارُهُ خَمْسِينَ أَلْفَ سَنَةٍ ﴿٤﴾ فَاصْبِرْ صَبْرًا جَمِيلًا ﴿٥﴾ إِنَّهُمْ يَرَوْنَهُ بَعِيدًا ﴿٦﴾ وَنَرَاهُ قَرِيبًا ﴿٧﴾ يَوْمَ تَكُونُ السَّمَاءُ كَالْمُهْلِ ﴿٨﴾ وَتَكُونُ الْجِبَالُ كَالْعِهْنِ ﴿٩﴾ وَلَا يَسْأَلُ حَمِيمٌ حَمِيمًا ﴿١٠﴾

(٣٥) کەواتە ئەمڕۆ ئا لێرە هیچ دڵسۆزێکی نییە.
(٣٦) خۆراکیشی تەنها لەکێم و زوخـاوی داچـۆڕاو نەبێت هیچی تر نییە.
(٣٧) کە، کەس نایخوات، جگە لە تاوانباران.
(٣٨) سوێندم بەو شتانەی کە دەیبینن.
(٣٩) بەوەش کە نایبینن و نادیارن.
(٤٠) بەڕاستی ئەم قورئانـە لـە زاری پێغەمبـەرێکی بەڕێزەوە پێتـان رادەگەیـەنرێت، یـاخود لـە رێگـەی فرستادەیەکی بـەڕێزەوە پێتـان دەگـات کـە جوبرەئیلی فریشتەیە.
(٤١) دڵنیابن کە ئەم قورئانـە گوفتـاری شـاعیر نیـە، ئەوە بۆ زۆر کەمتان باوەڕ دەهێنن؟!
(٤٢) گوفتاری فاڵچی و زیـوانیش نیـە، ئـەوە بـۆ زۆر کەمتان یاداوەری وەردەگرن؟!
(٤٣) بـەڵکو ئـەم قورئانـە لەلایـەن پـەروەردگاری جیهانەکانەوە رەوانەکراوە و نێردراوەتە خوارەوە.
(٤٤) خۆ ئەگـەر محمد ﷺ هـەندێک قسەو گوفتـار بەدەم ئێمەوە هەڵبەستایە.
(٤٥) ئەوە بەهێزو دەسەڵاتی خۆمان دەمانگرت.
(٤٦) لەوەودوا رەگی دڵی دەپچڕێنین و دەیمرێنین.
(٤٧) ئەوسا هیچ کەسێک نییە لـە ئێـوە بەربەسـت و بەرگری بکات لە ئێمە.
(٤٨) بەڕاستی ئەم قورئانە یاداوەری و یادخستـنەوەیە بۆ پارێزکاران و خواناسان.
(٤٩) ئێمـە بەڕاستی چـاک دەزانـین کەلـە ئێـوەدا کەسانێک هەن و پەیدادەبن ئەم قورئانە بەدرۆ دەزانن.
(٥٠) بێگومان قورئان لـە رۆژی دوایـدا دەبێتـە هـۆی ئاهو ناڵە و پەشیمانی بێسنوور بۆ بێباوەڕان.
(٥١) بەڕاستی ئەم قورئانە حەق و راستەقینەیەکی دڵنیا بەخشە بە ئیمانداران.
(٥٢) کەواتە ئەی پێغەمبەر ﷺ، ئەی ئیماندار؛ بەردەوام تەسبیحات و ستایشی پەروەردگاری مەزن و گەورەت بکە.

سوورەتی (المعـارج)

بەناوی خوای بەخشندە و میهرەبان

(١) داواکارێک پرسیاری کرد دەربارەی سزایەک کە هەر پێش دێت...
(٢) جا ئەو سزایە؛ یەخەی هەموو بێباوەڕان دەگرێت و هیچ هێزێک ناتوانێت پەنایان بدات و لێیان دوور بخاتەوە.
(٣) ئەو سزاو تۆڵەیە لەلایەن خوای خاوەنی گەورەیی و پلەو پایە و جێ بەرزەکان.
(٤) فریشتەکان و جوبرەئیل بەرز دەبنەوە بۆ لای پەروەردگار لەرۆژێکدا کە ماوەکەی پەنجا هەزار ساڵە (بەحسابـی ئـادەمیزاد) یاخود مەبەست درێژی رۆژی قیامەتە کە پەنجا هەزار ساڵ دەخایەنێت بە نیسبەت خوانەناسانەوە.
(٥) کەواتە خۆگرو ئارامگربە بە شێوەیەکی جوان و چاک (لەبەرامبەر هەڵوێستی نادروستی خوا نەناسانەوە).
(٦) بەڕاستی ئەو بێباوەڕانە، قیامەت بەدوور دەبینن، بەدووری دەزانن.
(٧) ئێمەش، زۆر بەنزیکی دەزانین (چونکە خوا خۆی بەدیهێنەری کاتە).
(٨) رۆژێک دێت، ئاسمان وەک کانزایەکی تواوەی لێ دێت (یەکێکە لە قۆناغەکانی هەڵوەشاندنەوەی بوونەوەر).
(٩) کێوەکانیش وەکو خوری شیکراوە (فشۆڵ دەبن).
(١٠) دۆستی گیانی بەگیانی لە یەکدی ناپرسنەوە، کەس ناپەرژێتە سەرکەس، بەڵکو هەرکەس خەمی خۆیەتی.

يُبَصَّرُونَهُمْ يَوَدُّ الْمُجْرِمُ لَوْ يَفْتَدِي مِنْ عَذَابِ يَوْمِئِذٍ بِبَنِيهِ ﴿١١﴾ وَصَاحِبَتِهِ وَأَخِيهِ ﴿١٢﴾ وَفَصِيلَتِهِ الَّتِي تُؤْوِيهِ ﴿١٣﴾ وَمَن فِي الْأَرْضِ جَمِيعًا ثُمَّ يُنجِيهِ ﴿١٤﴾ كَلَّا إِنَّهَا لَظَىٰ ﴿١٥﴾ نَزَّاعَةً لِّلشَّوَىٰ ﴿١٦﴾ تَدْعُو مَنْ أَدْبَرَ وَتَوَلَّىٰ ﴿١٧﴾ وَجَمَعَ فَأَوْعَىٰ ﴿١٨﴾ ۞ إِنَّ الْإِنسَانَ خُلِقَ هَلُوعًا ﴿١٩﴾ إِذَا مَسَّهُ الشَّرُّ جَزُوعًا ﴿٢٠﴾ وَإِذَا مَسَّهُ الْخَيْرُ مَنُوعًا ﴿٢١﴾ إِلَّا الْمُصَلِّينَ ﴿٢٢﴾ الَّذِينَ هُمْ عَلَىٰ صَلَاتِهِمْ دَائِمُونَ ﴿٢٣﴾ وَالَّذِينَ فِي أَمْوَالِهِمْ حَقٌّ مَّعْلُومٌ ﴿٢٤﴾ لِّلسَّائِلِ وَالْمَحْرُومِ ﴿٢٥﴾ وَالَّذِينَ يُصَدِّقُونَ بِيَوْمِ الدِّينِ ﴿٢٦﴾ وَالَّذِينَ هُم مِّنْ عَذَابِ رَبِّهِم مُّشْفِقُونَ ﴿٢٧﴾ إِنَّ عَذَابَ رَبِّهِمْ غَيْرُ مَأْمُونٍ ﴿٢٨﴾ وَالَّذِينَ هُمْ لِفُرُوجِهِمْ حَافِظُونَ ﴿٢٩﴾ إِلَّا عَلَىٰ أَزْوَاجِهِمْ أَوْ مَا مَلَكَتْ أَيْمَانُهُمْ فَإِنَّهُمْ غَيْرُ مَلُومِينَ ﴿٣٠﴾ فَمَنِ ابْتَغَىٰ وَرَاءَ ذَٰلِكَ فَأُولَٰئِكَ هُمُ الْعَادُونَ ﴿٣١﴾ وَالَّذِينَ هُمْ لِأَمَانَاتِهِمْ وَعَهْدِهِمْ رَاعُونَ ﴿٣٢﴾ وَالَّذِينَ هُم بِشَهَادَاتِهِمْ قَائِمُونَ ﴿٣٣﴾ وَالَّذِينَ هُمْ عَلَىٰ صَلَاتِهِمْ يُحَافِظُونَ ﴿٣٤﴾ أُولَٰئِكَ فِي جَنَّاتٍ مُّكْرَمُونَ ﴿٣٥﴾ فَمَالِ الَّذِينَ كَفَرُوا قِبَلَكَ مُهْطِعِينَ ﴿٣٦﴾ عَنِ الْيَمِينِ وَعَنِ الشِّمَالِ عِزِينَ ﴿٣٧﴾ أَيَطْمَعُ كُلُّ امْرِئٍ مِّنْهُمْ أَن يُدْخَلَ جَنَّةَ نَعِيمٍ ﴿٣٨﴾ كَلَّا إِنَّا خَلَقْنَاهُم مِّمَّا يَعْلَمُونَ ﴿٣٩﴾



(١١) ئەوانە پیشانی یەکتر دەدرێن، تاوانبارو گوناهکار ئاوات دەخوازێت کە ئەگەر بکرێت بۆ دەرباز بوونی خۆی لە سزای ئەو رۆژە هەموو کوڕەکانی بکاتە قوربانی خۆی!!

(١٢) هاوسەرو براکەی!!

(١٣) خزم و عەشرەتی کەلە دنیادا پەنایان دەدا.

(١٤) بەهەرچی دانیشتوانی سەر زەویش هەیە ئەگەر بۆی بکرێت بیکاتە قوربانی خۆی، پاشان خوا رزگاری بکات .

(١٥) نەخێر.. ئەو ئاواتانە هیچی نایەتە دی.. بەڕاستی دۆزەخ ئامادەیەو بڵێسەدارەو داخ لەدڵە.

(١٦) لەکاتێکدا داماڵێنەری پێستی سەرو هەموو ئەندامەکانە.

(١٧) دۆزەخ بانگی ئەوانە دەکات کە لە دنیادا پشتیان لە حەق و ڕاستی هەڵدەکردو گوێیان پێ‌نەدەدا.

(١٨) ماڵ و سامانیان کۆ دەکردەوە و دەیانشاردەوە (گوێیان نەدەدا بە حەڵاڵ وحەرام).

(١٩) بەڕاستی ئینسان بە شپرزەیی و تەنگەتاوی دروستکراون.

(٢٠) کاتێک ناخۆشی تووش بێت بێزار و دەم بە هاوارە.

(٢١) کاتێکیش خێرو بەرەکەتی تووش بوو، دەستی دەنوقێنێت و قەدەغەی چاکە دەکات.

(٢٢) تەنها ئەو نوێژگەرانە نەبێت...

(٢٣) ئەوانەی کە لەسەر نوێژەکانیان بەردەوامن.

(٢٤) هەروەها ئەوانەی کە بەشێکی دیاریکراو لە سامانیاندا هەیە (بۆ جیهاد و تێکۆشان)...

(٢٥) بۆ هەژاری داواکارو بێ نەوای داوانەکەر.

(٢٦) ئەوانەی کە باوەڕی ڕاست و ڕەوان دەهێنن بە رۆژی پاداشت.

(٢٧) ئەو کەسانەی کە دڵە لەرزەیان هەیە لە تۆڵەی پەروەردگاریان.

(٢٨) بەڕاستی سزای پەروەردگاریان کەس لێی ئەمین نابێت.

(٢٩) ئەوانەی داوێنی خۆیان دەپارێزن.

(٣٠) مەگەر لەگەڵ هاوسەرەکانیاندا یاخود کەنیزەکەکانیان (کە بەهۆی بارودۆخی تایبەتەوە هەبوو)، ئەوانە بەڕاستی لۆمەکراو نابن.

(٣١) جانەوەی بێجگە لەوحاڵەتانە ڕێگەیتر بگرێت (بۆ تێرکردنی ئارەزووەکانی)، ئەوانە لە سنوور ترازاوو دەستدرێژکەرن.

(٣٢) هەروەها ئەوانەی کە ئەمانەت دەپارێزن و پەیمان دەبەنە سەر.

(٣٣) ئەوانەی کە هەڵدەسن بەو شایەتی‌یەی کە لە لایانە.

(٣٤) ئەوانەی کە پارێزگاری نوێژەکانیان دەکەن و (لەکاتی خۆیدا ئەنجامی دەدەن).

(٣٥) ئا ئەوانە لە باخەکانی بەهەشتدا ڕێز لێنراون.

(٣٦) ئاخۆ ئەوانەی بێ بڕوا بوون چیانە کە تۆ دەرکەوتیت بەپەلە دێن بۆلات.

(٣٧) بەلای ڕاست و چەپدا خۆیان ون دەکەن و لە دوورەوە پۆل پۆل بەدەوری یەکدا کۆدەبنەوە.

(٣٨) ئا بەو حاڵەوە، هەریەکەیان بەتەمایە بخرێتە ناو بەهەشتی پڕ لە ئازو نیعمەتەوە؟!

(٣٩) نەخێر، وانی‌یە، بەڕاستی خۆشیان دەزانن لە چی دروستمان کردوون (بۆ ئەوەندە لەخۆیان بایی بوون).

فَلَا أُقْسِمُ بِرَبِّ الْمَشَارِقِ وَالْمَغَارِبِ إِنَّا لَقَادِرُونَ ﴿٤٠﴾ عَلَىٰ أَن نُّبَدِّلَ خَيْرًا مِّنْهُمْ وَمَا نَحْنُ بِمَسْبُوقِينَ ﴿٤١﴾ فَذَرْهُمْ يَخُوضُوا وَيَلْعَبُوا حَتَّىٰ يُلَاقُوا يَوْمَهُمُ الَّذِي يُوعَدُونَ ﴿٤٢﴾ يَوْمَ يَخْرُجُونَ مِنَ الْأَجْدَاثِ سِرَاعًا كَأَنَّهُمْ إِلَىٰ نُصُبٍ يُوفِضُونَ ﴿٤٣﴾ خَاشِعَةً أَبْصَارُهُمْ تَرْهَقُهُمْ ذِلَّةٌ ذَٰلِكَ الْيَوْمُ الَّذِي كَانُوا يُوعَدُونَ ﴿٤٤﴾

سُورَةُ نُوحٍ

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

إِنَّا أَرْسَلْنَا نُوحًا إِلَىٰ قَوْمِهِ أَنْ أَنذِرْ قَوْمَكَ مِن قَبْلِ أَن يَأْتِيَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿١﴾ قَالَ يَا قَوْمِ إِنِّي لَكُمْ نَذِيرٌ مُّبِينٌ ﴿٢﴾ أَنِ اعْبُدُوا اللَّهَ وَاتَّقُوهُ وَأَطِيعُونِ ﴿٣﴾ يَغْفِرْ لَكُم مِّن ذُنُوبِكُمْ وَيُؤَخِّرْكُمْ إِلَىٰ أَجَلٍ مُّسَمًّى إِنَّ أَجَلَ اللَّهِ إِذَا جَاءَ لَا يُؤَخَّرُ لَوْ كُنتُمْ تَعْلَمُونَ ﴿٤﴾ قَالَ رَبِّ إِنِّي دَعَوْتُ قَوْمِي لَيْلًا وَنَهَارًا ﴿٥﴾ فَلَمْ يَزِدْهُمْ دُعَائِي إِلَّا فِرَارًا ﴿٦﴾ وَإِنِّي كُلَّمَا دَعَوْتُهُمْ لِتَغْفِرَ لَهُمْ جَعَلُوا أَصَابِعَهُمْ فِي آذَانِهِمْ وَاسْتَغْشَوْا ثِيَابَهُمْ وَأَصَرُّوا وَاسْتَكْبَرُوا اسْتِكْبَارًا ﴿٧﴾ ثُمَّ إِنِّي دَعَوْتُهُمْ جِهَارًا ﴿٨﴾ ثُمَّ إِنِّي أَعْلَنتُ لَهُمْ وَأَسْرَرْتُ لَهُمْ إِسْرَارًا ﴿٩﴾ فَقُلْتُ اسْتَغْفِرُوا رَبَّكُمْ إِنَّهُ كَانَ غَفَّارًا ﴿١٠﴾

(٤٠) جا سوێند بە پەروەردگاری خۆرهەڵاتەکان و خۆرئاواکان، بەڕاستی ئێمە هەمیشە بەدەسەڵاتین لەسەر:...

(٤١) ئەمانە لەناوبەرین و کەسانی چاکتربهێنینە کایەوە، ئێمە بۆ ئەو مەبەستە بێ توانا نین.

(٤٢) جاوازیان لێ بهێنە با هەر ڕۆبچن لە بێباوەڕیدا، با هەر گەمەو گاڵتە بکەن، هەتا دووچاری ڕۆژی خۆیان دەبن کە هەڕەشەیان پێ لێ دەکرێت.

(٤٣) ئەو ڕۆژەی بەپەلە لە گۆڕەکانیان دێنە دەرەوە، دەڵێی بۆ لای بت و پەرستراوەکانیان ڕادەکەن!!

(٤٤) چاویان شۆڕە و (شەرمەزارو خەجاڵەتن) زەلیلی و سەرشۆڕی ماندووی کردوون، جا ئەمە ئەو ڕۆژەیە کە کاتی خۆی بەڵێنیان پێدەدرا و ئەوان بڕوایان پێی نەبوو.

## سوورەتی (نــوح)

بەناوی خوای بەخشندە و میهرەبان

(١) بەڕاستی ئێمە نوح مان ڕەوانەکرد بۆ لای قەومەکەی، فەرمانمان پێدا کە: قەومەکەت بێدار بکەرەوە پێش ئەوەی سزایەکی بە ئێش یەخەیان پێبگرێت.

(٢) ئەویش وتی: ئەی قەوم و هۆز و گەلم من بێگومان بێدارکەرەوەیەکی ئاشکرام بۆتان.

(٣) داواتان لێ دەکەم کە: هەر خوا بپەرستن و لە خەشم و قینی، خۆتان بپارێزن و فەرمانبەرداری منیش بن.

(٤) ئەوکاتە خوا لە گوناهەکانتان خۆش دەبێت و دەتانهێڵێتەوە بۆ کاتێکی دیاری کراو، بێگومان کاتی دیاری کراوی خوا وەختێک پێش دێت، بەهیچ شێوەیەک دواناکەوێت ئەگەر بتانزانیایە.

(٥) دوای سەدەها ساڵ بانگەواز نوح سکاڵای کردو وتی: پەروەدگارا من بە شەو و بە ڕۆژ بانگی قەوم و گەلەکەمم کرد (بۆ یەکخواناسی و پارێزکاری).

(٦) کەچی بانگەوازەکەی من هیچی زیاد نەکردن؛ تەنها ڕاکردنیان نەبێت.

(٧) بەڕاستی من هەموو جارێک کە بانگم دەکردن تا لێیان خۆش ببیت، پەنجەیان دەخستە گوێچکەیانەوە تا نەبیستن، جلەکانیان بەسەر خۆیاندا دەدا تا نەمبینن، زۆرگەرم بوون لەسەر بێباوەڕی و خۆیان بەزل دەزانی و لووت بەرز بوون.

(٨) پاشان من بە ئاشکرا بانگم کردن و (وتارم بۆ دان).

(٩) ئینجا من بەڕوونی و بێپەردە هەموو شتێکم بۆ باس کردن، هەندێ جاریش بەنهێنی قسەم بۆ دەکردن (بۆ تاکە تاکە و خێزانەکانیان).

(١٠) بەردەوام پێم دەگوتن: ئێوە داوای لێخۆشبوون لە پەروەردگارتان بکەن چونکە بەڕاستی ئەو زاتێکی لێخۆشبووە.

يُرْسِلِ ٱلسَّمَآءَ عَلَيْكُم مِّدْرَارًا ﴿١١﴾ وَيُمْدِدْكُم بِأَمْوَٰلٍ وَبَنِينَ وَيَجْعَل لَّكُمْ جَنَّٰتٍ وَيَجْعَل لَّكُمْ أَنْهَٰرًا ﴿١٢﴾ مَّا لَكُمْ لَا تَرْجُونَ لِلَّهِ وَقَارًا ﴿١٣﴾ وَقَدْ خَلَقَكُمْ أَطْوَارًا ﴿١٤﴾ أَلَمْ تَرَوْا۟ كَيْفَ خَلَقَ ٱللَّهُ سَبْعَ سَمَٰوَٰتٍ طِبَاقًا ﴿١٥﴾ وَجَعَلَ ٱلْقَمَرَ فِيهِنَّ نُورًا وَجَعَلَ ٱلشَّمْسَ سِرَاجًا ﴿١٦﴾ وَٱللَّهُ أَنۢبَتَكُم مِّنَ ٱلْأَرْضِ نَبَاتًا ﴿١٧﴾ ثُمَّ يُعِيدُكُمْ فِيهَا وَيُخْرِجُكُمْ إِخْرَاجًا ﴿١٨﴾ وَٱللَّهُ جَعَلَ لَكُمُ ٱلْأَرْضَ بِسَاطًا ﴿١٩﴾ لِّتَسْلُكُوا۟ مِنْهَا سُبُلًا فِجَاجًا ﴿٢٠﴾ قَالَ نُوحٌ رَّبِّ إِنَّهُمْ عَصَوْنِى وَٱتَّبَعُوا۟ مَن لَّمْ يَزِدْهُ مَالُهُۥ وَوَلَدُهُۥٓ إِلَّا خَسَارًا ﴿٢١﴾ وَمَكَرُوا۟ مَكْرًا كُبَّارًا ﴿٢٢﴾ وَقَالُوا۟ لَا تَذَرُنَّ ءَالِهَتَكُمْ وَلَا تَذَرُنَّ وَدًّا وَلَا سُوَاعًا وَلَا يَغُوثَ وَيَعُوقَ وَنَسْرًا ﴿٢٣﴾ وَقَدْ أَضَلُّوا۟ كَثِيرًا ۖ وَلَا تَزِدِ ٱلظَّٰلِمِينَ إِلَّا ضَلَٰلًا ﴿٢٤﴾ مِّمَّا خَطِيٓـَٰٔتِهِمْ أُغْرِقُوا۟ فَأُدْخِلُوا۟ نَارًا فَلَمْ يَجِدُوا۟ لَهُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ أَنصَارًا ﴿٢٥﴾ وَقَالَ نُوحٌ رَّبِّ لَا تَذَرْ عَلَى ٱلْأَرْضِ مِنَ ٱلْكَٰفِرِينَ دَيَّارًا ﴿٢٦﴾ إِنَّكَ إِن تَذَرْهُمْ يُضِلُّوا۟ عِبَادَكَ وَلَا يَلِدُوٓا۟ إِلَّا فَاجِرًا كَفَّارًا ﴿٢٧﴾ رَّبِّ ٱغْفِرْ لِى وَلِوَٰلِدَىَّ وَلِمَن دَخَلَ بَيْتِىَ مُؤْمِنًا وَلِلْمُؤْمِنِينَ وَٱلْمُؤْمِنَٰتِ وَلَا تَزِدِ ٱلظَّٰلِمِينَ إِلَّا تَبَارًۢا ﴿٢٨﴾

(١١) بارانتان بە لێزمەو خوڕەم بۆ دەبارێنێت.

(١٢) ماڵ و سامان و نەوەتان پێدەبەخشێت، هاوڕێ لەگەڵ باخ و باخاتدا، روبارو چەم و جۆگەتان بۆ بەدی دەهێنێت.

(١٣) ئەوە چیتانە ئێوە قەدری خوا نازانن، بۆ رێزی بۆ دانانێن و لێی ناترسن.

(١٤) خۆ ئێوە پێشتر نەبوون؛ هەر خوا خۆی بە چەند قۆناغدا ئێوەی تێپەڕاندو دروستی کردن.

(١٥) ئایا سەرنجتان نەداوە چۆن خوا حەوت چین ئاسمانی دروستکردووە؟!

(١٦) مانگی کردۆتە هۆی روناکی تیایانداو خۆریشی داگیرساندووە.

(١٧) هەر خوا خۆی ئێوەی لە خاکی زەوی بەدیهێناوە و پێی گەیاندوون.

(١٨) پاشان دەتانمرێنێت و دەتانخاتەوە ناوی هەرکاتیش بیەوێت دەرتان دەهێنێتەوە.

(١٩) هەر ئەو خوایە زەوی بۆ راخستوون (چۆنتان بوێت وبۆچیتان بوێت بەدەستانەوەدێت)

(٢٠) تا (بە ئارەزووی خۆتان) پیایدا بگەڕێن لە رێگە فراوانەکاندا.

(٢١) سەرئەنجام، نوح نائومێد بوو بۆیە وتی: پەروەردگارا بەڕاستی ئەوان یاخی بوون لێم، شوێنی ئەو کەسانە کەوتن کە ماڵ و نەوەکانیان قازانجی پێنەگەیاندن زیان نەبێت.

(٢٢) خوانەناسان پیلانی گەورە و نەخشەی سامناکیان داڕشت.

(٢٣) وتیان: خەڵکینە نەکەن واز لە خواکانتان بهێنن!! نەکەن واز لە (ودو سواع و یەغوث و یەعوق ونەسر) بهێنن.

(٢٤) بێگومان ئەوانە زۆر کەسیان گومراکرد، پەروەردگارا، ئەم ستەمکارانە تەنها گومڕای نەبێت هیچی تریان بۆ زیاد مەکە.

(٢٥) جا لە سەرئەنجامی گوناهو تاوانیاندا، هۆزی نالەبار نوقم کران لە زریانەکەدا، ئینجا خرانە ناو ئاگرەوە، کەسیشیان دەست نەکەوت لە خەشم و سزای خوایی پەنایان بدات.

(٢٦) ئینجا نوح وتی: پەروەردگارا هیچ کەسێک لە بێبڕوایان لەسەر زەویدا مەهێڵە و تۆویان ببڕە.

(٢٧) چونکە بەڕاستی ئەگەر تۆ وازیان لێ بهێنیت هەرچی بەندەکانی تۆیە گومڕای دەکەن و کەسیشیان لێنابێت (لە نەوەی تازە) مەگەر خراپەکار و تاوانبار نەبێت.

(٢٨) پەروەردگارا؛ لە خۆم و دایک و باوکم و ئەوانە خۆش ببە کە دێنە ماڵم؛ بە ئیمان و باوەڕەوە، هەروەها لە ئیماندارانی پیاو و ئیماندارانی ئافرەتیش خۆش ببە، ستەمکارانیش تەنها تیاچوون نەبێت هیچی تر نەکەیتە بەشیان.



بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

قُلْ أُوحِيَ إِلَيَّ أَنَّهُ اسْتَمَعَ نَفَرٌ مِّنَ الْجِنِّ فَقَالُوا إِنَّا سَمِعْنَا قُرْآنًا عَجَبًا ﴿١﴾ يَهْدِي إِلَى الرُّشْدِ فَآمَنَّا بِهِ ۖ وَلَن نُّشْرِكَ بِرَبِّنَا أَحَدًا ﴿٢﴾ وَأَنَّهُ تَعَالَىٰ جَدُّ رَبِّنَا مَا اتَّخَذَ صَاحِبَةً وَلَا وَلَدًا ﴿٣﴾ وَأَنَّهُ كَانَ يَقُولُ سَفِيهُنَا عَلَى اللَّهِ شَطَطًا ﴿٤﴾ وَأَنَّا ظَنَنَّا أَن لَّن تَقُولَ الْإِنسُ وَالْجِنُّ عَلَى اللَّهِ كَذِبًا ﴿٥﴾ وَأَنَّهُ كَانَ رِجَالٌ مِّنَ الْإِنسِ يَعُوذُونَ بِرِجَالٍ مِّنَ الْجِنِّ فَزَادُوهُمْ رَهَقًا ﴿٦﴾ وَأَنَّهُمْ ظَنُّوا كَمَا ظَنَنتُمْ أَن لَّن يَبْعَثَ اللَّهُ أَحَدًا ﴿٧﴾ وَأَنَّا لَمَسْنَا السَّمَاءَ فَوَجَدْنَاهَا مُلِئَتْ حَرَسًا شَدِيدًا وَشُهُبًا ﴿٨﴾ وَأَنَّا كُنَّا نَقْعُدُ مِنْهَا مَقَاعِدَ لِلسَّمْعِ ۖ فَمَن يَسْتَمِعِ الْآنَ يَجِدْ لَهُ شِهَابًا رَّصَدًا ﴿٩﴾ وَأَنَّا لَا نَدْرِي أَشَرٌّ أُرِيدَ بِمَن فِي الْأَرْضِ أَمْ أَرَادَ بِهِمْ رَبُّهُمْ رَشَدًا ﴿١٠﴾ وَأَنَّا مِنَّا الصَّالِحُونَ وَمِنَّا دُونَ ذَٰلِكَ ۖ كُنَّا طَرَائِقَ قِدَدًا ﴿١١﴾ وَأَنَّا ظَنَنَّا أَن لَّن نُّعْجِزَ اللَّهَ فِي الْأَرْضِ وَلَن نُّعْجِزَهُ هَرَبًا ﴿١٢﴾ وَأَنَّا لَمَّا سَمِعْنَا الْهُدَىٰ آمَنَّا بِهِ ۖ فَمَن يُؤْمِن بِرَبِّهِ فَلَا يَخَافُ بَخْسًا وَلَا رَهَقًا ﴿١٣﴾

الحزب ٥٨

## سوورەتی (الجـن)

بەناوی خوای بەخشندە و میهرەبان

(١) ئەی محمد ﷺ پێیان بڵێ: وەحی و نیگام پێڕاگەیەنراوە کە بەڕاستی دەستەیەک لە پەریان گوێیان گرتووە بۆ خوێندنەوەی قورئان و جا کە تەواو بووە وتویانە: بەڕاستی ئێمە خوێندنەوەیەکی سەرسوڕهێنەرمان بیست.

(٢) هیدایەت دەدات بۆ ڕێبازی ژیری و تێگەیشتن، ئێمەش باوەڕمان پێکردو هەرگیز کەس ناکەینە شەریک و هاوەڵ بۆ پەروەردگارمان.

(٣) بەڕاستی پەروەردگاری پایەبڵندمان مەزن و گەورەیە، بێگومان ئەو زاتە نە هاوسەری بڕیارداوە نە نەوەش.

(٤) بەڕاستی بێ دین و یاخیەکەمان (واتە ئیبلیس) شتی زۆر نارەواو نابەجێی بۆ خوا هەڵبەستووە (دەیەوێت هەموومان گومڕا بکات).

(٥) ئێمە گومانمان وابوو کە دەستەی ئادەمیزادو پەری هەرگیز درۆ بەناوی خواوە ناکەن!!

(٦) بەڕاستی پیاوانێک لە دەستەی ئادەمیزاد پەنایان دەبرد بە پیاوانێک لە دەستەی پەریەکان (پەریەکان ئەمەیان بەهەڵزانی) کەچی ئەوەندەی تر ماندوویان کردن (بەخورافات و شتی بێسەرو بەر).

(٧) جا بێگومان پەریەکانیش گومانیان وەک گومانی ئێوە وابوو کە: ئیتر خوا هەرگیز هیچ پێغەمبەرێکی تر نانێرێت.

(٨) ئێمەش بەڕاستی بەرەو ئاسمان کشاین و هەست و هۆشمان خستەکار، سەرنجماندا کە پڕە لە پاسەوانی بەتواناو بێ شومار، ئەیزەکیش بە هەموولایەکدا دەکشا، (دیار بوو کە ڕووداوێکی گەورە ڕووی دابوو).

(٩) ئێمە جاران لە هەندێک شوێنی ئاسماندا خۆمان حەشاردەدا بۆ گوێگرتن و دەنگوباس بیستن، بەڵام ئێستا ئەوەی بیەوێت گوێ بگرێت یەکسەر ئەیزەکێکی بۆ ئامادەیە و بۆی دەهاوێژرێت و لەناوی دەبات.

(١٠) جا بەڕاستی ئێمە نازانین ئایا نەخشەیەکی شەڕو وێرانکاری کێشراوە بۆ دانیشتوانی سەر زەوی، یاخود پەروەردگاریان دەیەوێت ڕێنموویی و هیدایەتیان بدات بۆ دینداری و سەرفەرازی.

(١١) بێگومان ئێمە کەسانی چاک و دیندارمان تێدا هەیە، هەروەها کەسانی تریش کەبەو شێوەیە نین، ئێمە جاران ڕێگەو ڕێبازو بەرنامەی هەمە جۆرمان گرتبووەبەر (بەڵام ئێستە بەرنامەی ئیسلام ڕوون و دیارە).

(١٢) ئێمە دڵنیا بووین کە هەرگیز لەژێر دەسەڵاتی خوا دەرناچین لە زەویدا، هەروەها بەهەڵاتن و خۆ دزینەوەش هەرگیز لە ژێر دەسەڵاتی خوا دەرناچین.

(١٣) بەڕاستی ئێمە کاتێک گوێمان لە بانگەوازی هیدایەت بوو، یەکسەر باوەڕمان پێکرد، جا ئەوەی ئیمان بهێنێت بەپەروەردگاری، ئیتر ناترسێت لەوەی، کردەوە چاکەکانی بێنرخ تەماشا بکرێت، لە گوناهەکانیشی چاوپۆشی نەکرێت.

وَأَنَّا مِنَّا الْمُسْلِمُونَ وَمِنَّا الْقَاسِطُونَ فَمَنْ أَسْلَمَ فَأُولَئِكَ تَحَرَّوْا رَشَدًا ﴿١٤﴾ وَأَمَّا الْقَاسِطُونَ فَكَانُوا لِجَهَنَّمَ حَطَبًا ﴿١٥﴾ وَأَلَّوِ اسْتَقَامُوا عَلَى الطَّرِيقَةِ لَأَسْقَيْنَاهُمْ مَاءً غَدَقًا ﴿١٦﴾ لِنَفْتِنَهُمْ فِيهِ وَمَنْ يُعْرِضْ عَنْ ذِكْرِ رَبِّهِ يَسْلُكْهُ عَذَابًا صَعَدًا ﴿١٧﴾ وَأَنَّ الْمَسَاجِدَ لِلَّهِ فَلَا تَدْعُوا مَعَ اللَّهِ أَحَدًا ﴿١٨﴾ وَأَنَّهُ لَمَّا قَامَ عَبْدُ اللَّهِ يَدْعُوهُ كَادُوا يَكُونُونَ عَلَيْهِ لِبَدًا ﴿١٩﴾ قُلْ إِنَّمَا أَدْعُو رَبِّي وَلَا أُشْرِكُ بِهِ أَحَدًا ﴿٢٠﴾ قُلْ إِنِّي لَا أَمْلِكُ لَكُمْ ضَرًّا وَلَا رَشَدًا ﴿٢١﴾ قُلْ إِنِّي لَنْ يُجِيرَنِي مِنَ اللَّهِ أَحَدٌ وَلَنْ أَجِدَ مِنْ دُونِهِ مُلْتَحَدًا ﴿٢٢﴾ إِلَّا بَلَاغًا مِنَ اللَّهِ وَرِسَالَاتِهِ وَمَنْ يَعْصِ اللَّهَ وَرَسُولَهُ فَإِنَّ لَهُ نَارَ جَهَنَّمَ خَالِدِينَ فِيهَا أَبَدًا ﴿٢٣﴾ حَتَّى إِذَا رَأَوْا مَا يُوعَدُونَ فَسَيَعْلَمُونَ مَنْ أَضْعَفُ نَاصِرًا وَأَقَلُّ عَدَدًا ﴿٢٤﴾ قُلْ إِنْ أَدْرِي أَقَرِيبٌ مَا تُوعَدُونَ أَمْ يَجْعَلُ لَهُ رَبِّي أَمَدًا ﴿٢٥﴾ عَالِمُ الْغَيْبِ فَلَا يُظْهِرُ عَلَى غَيْبِهِ أَحَدًا ﴿٢٦﴾ إِلَّا مَنِ ارْتَضَى مِنْ رَسُولٍ فَإِنَّهُ يَسْلُكُ مِنْ بَيْنِ يَدَيْهِ وَمِنْ خَلْفِهِ رَصَدًا ﴿٢٧﴾ لِيَعْلَمَ أَنْ قَدْ أَبْلَغُوا رِسَالَاتِ رَبِّهِمْ وَأَحَاطَ بِمَا لَدَيْهِمْ وَأَحْصَى كُلَّ شَيْءٍ عَدَدًا ﴿٢٨﴾

(١٤) بەراستی لەناو ئێمەدا کەسانی موسڵمان و خواناس هەیە، کەسانی بێدین و خوانەناس و سەرکەشیش، جا ئەوەی موسڵمان دەبێت دیارە کە رێبازی سەرفەرازی دۆزیوەتەوە.

(١٥) بەڵام خوانەناس و سەرکەشەکان بەسەریانەوە ناچێت بەڵکو دەبنە سوتەمەنی دۆزەخ (ئیرەدا گوفتاری پەریە نیماندارەکان تەواو دەبێت).

(١٦) جا ئەگەر ئەوخەڵکە رێگەی ئیسلامەتی و دینداری بگرنە بەر ئێمە بارانی پڕ بەرەکەتیان بەسەردا دەبارێنین.

(١٧) تا لەوەشدا تاقییان بکەینەوە و (بە تەواوی دەرکەوێت کێ بەندەی راستەقینەیە و کێیش بە دنیا دەخەڵەتێت) جا ئەوەی لە یادو بەرنامەی پەروەردگاری لابدات، دەیخاتە ناو سزاو ئازارێکی بەردەوام.

(١٨) دڵنیابن کە: مزگەوتەکان تایبەتی خوای گەورەن، دەبێت هەر ئەوی تێدا بپەرسترێت و ناوی کەسی تر نەکرێتە شەریک و هاوتای ناوی ئەو زاتە.

(١٩) جاکاتێکیش بەندەی خوا محمد ﷺ بانگەوازی بۆ شوێنکەوتنی بەرنامەی خوا دەکرد (ئەو خەڵکە بەدەستەی ئادەمیزادو پەریەوە) خەریکبوو لە ناوی بەرن (نووری خوا بکوژێننەوە).

(٢٠) پێیان بڵێ: من هەر بەردەوام دەبم و هەر بانگەواز دەکەم بۆ لای پەروەردگارم، کەسیش ناکەمە هاوەڵ و شەریکی.

(٢١) هەروەها پێیان بڵێ: من هیچ جۆرە زەرەر و زیانێکم بەدەست نیە، هەروەها هیدایەتیش بەدەست من نیە (ئەگەر خۆتان بیرنەکەنەوە، قەناعەت بەزۆر نییە).

(٢٢) بڵێ: بەراستی من هەرگیز هیچ کەسێک لە خوا پەنام نادات ئەگەر خوا بیەوێت تووشی زیانێکم بکات و هەرگیز پەناگایەکم دەست ناکەوێت جگە لای خوا نەبێت.

(٢٣) بەڵکو من تەنها گەیاندنی پەیامەکان و بەرنامەی خوام لەسەرە، جا ئەوەی لە خواو پێغەمبەرەکەی یاخی ببێت ئەوە با دڵنیابێت کە دۆزەخی بۆ ئامادەکراوە بۆ هەمیشە و هەتاهەتایی.

(٢٤) هەتا کاتێک هەڕەشەکان دەبینن، ئەوکاتە ئیتر دەزانن، کێ پشتیوانی لاوازە و ژمارەی کەمە.

(٢٥) هەروەها پێیان بڵێ: من نازانم ئایا ئەو هەڕەشانەی لێتان دەکرێت نزیکە یاخود ماوەیەکی درێژی بۆ دادەنێت.

(٢٦) ئەو زاتە زانای نهێنی و شاراوەکانە، کەسیش لە نهێنی و شاراوەکانی ئاگادار ناکات.

(٢٧) مەگەر بۆ پێغەمبەرێک خوا خۆی رازی بێت (بەوەی هەندێ نهێنی بزانێت)، ئەوکاتە فریشتە دەکاتە پاسەوانی لە بەرو پشتەوە (تا پەری و شەیتانەکان نەتوانن زەفەری پێبەرن)...

(٢٨) تا خوا چاک بزانێت و ئاگاداربێت لەوەی بەرێکوپێکی پەیام و رێنموویی پەروەردگاریان گەیاندووە، هەرچەندە خوا بەهەموو ئەو شتانەش ئاگادارە کە کردوویانە و پێی هەستاون و هەموو شتێک لای ئەو زاتە بەژمارە ئامار کراوە.

سُورَةُ المُزَّمِّل

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

يَٰٓأَيُّهَا ٱلْمُزَّمِّلُ ﴿١﴾ قُمِ ٱلَّيْلَ إِلَّا قَلِيلًا ﴿٢﴾ نِّصْفَهُۥٓ أَوِ ٱنقُصْ مِنْهُ قَلِيلًا ﴿٣﴾ أَوْ زِدْ عَلَيْهِ وَرَتِّلِ ٱلْقُرْءَانَ تَرْتِيلًا ﴿٤﴾ إِنَّا سَنُلْقِى عَلَيْكَ قَوْلًا ثَقِيلًا ﴿٥﴾ إِنَّ نَاشِئَةَ ٱلَّيْلِ هِىَ أَشَدُّ وَطْـًٔا وَأَقْوَمُ قِيلًا ﴿٦﴾ إِنَّ لَكَ فِى ٱلنَّهَارِ سَبْحًا طَوِيلًا ﴿٧﴾ وَٱذْكُرِ ٱسْمَ رَبِّكَ وَتَبَتَّلْ إِلَيْهِ تَبْتِيلًا ﴿٨﴾ رَّبُّ ٱلْمَشْرِقِ وَٱلْمَغْرِبِ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ فَٱتَّخِذْهُ وَكِيلًا ﴿٩﴾ وَٱصْبِرْ عَلَىٰ مَا يَقُولُونَ وَٱهْجُرْهُمْ هَجْرًا جَمِيلًا ﴿١٠﴾ وَذَرْنِى وَٱلْمُكَذِّبِينَ أُو۟لِى ٱلنَّعْمَةِ وَمَهِّلْهُمْ قَلِيلًا ﴿١١﴾ إِنَّ لَدَيْنَآ أَنكَالًا وَجَحِيمًا ﴿١٢﴾ وَطَعَامًا ذَا غُصَّةٍ وَعَذَابًا أَلِيمًا ﴿١٣﴾ يَوْمَ تَرْجُفُ ٱلْأَرْضُ وَٱلْجِبَالُ وَكَانَتِ ٱلْجِبَالُ كَثِيبًا مَّهِيلًا ﴿١٤﴾ إِنَّآ أَرْسَلْنَآ إِلَيْكُمْ رَسُولًا شَٰهِدًا عَلَيْكُمْ كَمَآ أَرْسَلْنَآ إِلَىٰ فِرْعَوْنَ رَسُولًا ﴿١٥﴾ فَعَصَىٰ فِرْعَوْنُ ٱلرَّسُولَ فَأَخَذْنَٰهُ أَخْذًا وَبِيلًا ﴿١٦﴾ فَكَيْفَ تَتَّقُونَ إِن كَفَرْتُمْ يَوْمًا يَجْعَلُ ٱلْوِلْدَٰنَ شِيبًا ﴿١٧﴾ ٱلسَّمَآءُ مُنفَطِرٌۢ بِهِۦ ۚ كَانَ وَعْدُهُۥ مَفْعُولًا ﴿١٨﴾ إِنَّ هَٰذِهِۦ تَذْكِرَةٌ ۖ فَمَن شَآءَ ٱتَّخَذَ إِلَىٰ رَبِّهِۦ سَبِيلًا ﴿١٩﴾

سوورەتی (المزمل)

بەناوی خوای بەخشندە و میهرەبان

(١) ئـەی ئەوکەسـەی خـۆت داپۆشـیووە، ئـەی محمد ﷺ

(٢) شەو هەستە نوێژ بکە مەگەر کەمێکی نەبێت.

(٣) نیوەی یان کەمتر لە نیوەی لیٚ کەم بکەرەوە.

(٤) یاخود زیاتری بکـە و دەوری قورئـان بکـەرەوە بە وردی و لەسەرخۆ.

(٥) چونکە بەڕاستی ئێمە فـەرمووده‌و گوفتـارێکی سـەنگین دادەبەزێنینـە سـەرت (کـە بەهۆیـەوە بەرەنگاری ئەرک و زەحمەتی زۆر دەبیت).

(٦) بەڕاستی خۆ پێگەیاندن لە شەودا قورسترە لـە رووی کردارو باشترە لە رووی گوفتارەوە.

(٧) تۆ بۆت هەیە لە رۆژدا هەوڵ بدەیت (بانگەواز بکەیت) و بگەڕێیت، کۆششی زۆر بکەیت.

(٨) تۆ هەمیشە با ناوی پەروەردگارت ویردی سەر زارت بێت، بەدڵسۆزی و ملکەچیەوە رووی تیٚ بکە.

(٩) ئـەو زاتـەی کـە تـۆی رەوانـەکردوە؛ خـاوەن و پەروەردگاری رۆژهەلات و رۆژئاوایە، جگە لەو هیچ خوایەکی تر نیە فەرمانی بەدەست بێت، کەواتە هەر ئەو بکە بەپشتیوانی خۆت و داوای یارمـەتیی هـەر لەو بکە.

(١٠) لە بەرامبەر گوفتاری نارەوای خوانەناسانەوە هـەردەم خـۆ ڕاگربـەو بەشـێوازێکی جوان بـەجێیان بهێڵە.

(١١) واز بهێنە لە من و لەو خاوەن نازو نیعمەتانەی کە ئایینی من بەدرۆ دەزانن، تۆ کەمێک مۆڵەتیان بدە.

(١٢) بەڕاستی ئێمە کۆت و زنجیرو دۆزەخمان ئامادە کردووە (بۆ ئەو جۆرە تاوانبارانە).

(١٣) هەروەها خۆراکێک کە لە گەروو دەگیرێت، سەرەڕای سزای بە ئێش و ئازار.

(١٤) لە رۆژێکدا کە زەوی و کێوەکان دێنە لەرزە، سەرئەنجام کێوەکان وردو خاش دەبـن و وەکـو تەپۆلکـەی لمیـان لیٚ دێت.

(١٥) خۆ بەڕاستی ئێمە پێغەمبەرێکمان بـۆ رەوانـەکردوون کـە بوەتـە شـایەت بەسـەرتانەوە هـەروەکو چـۆن بـۆ لای فیرعەونیش پێغەمبەرێکمان رەوانە کرد.

(١٦) جا فیرعەون یاخی بوو لەو پێغەمبەرە، ئێمەش بەتوندی پێچامانەوە و بەڵایەکی گەورەمان بەسەر هێنا.

(١٧) (ئەگەر ئێوە لەسەر یاخی بوونتان بەردەوام بن)؛ جا چۆن خۆتان دەپارێزن لە رۆژێک کـە منـداڵ پـیر دەکـات و سەری سپی دەبێت.

(١٨) ئەو رۆژە ئاسمان بەهەموو ئەستێرە و هەسارەکانیەوە لەت و پەت دەبێت، بێگومان ئەو بەڵێنە هەر دێتە دی.

(١٩) بەڕاسـتی ئـەم سـوورەتەش یادخـەرەوە و ئامۆژگاریـە، بـۆ ئـەو کەسـەی دەیـەوێت رێگـە بـەرەو پـەروەردگاری بگرێـتەبەر.



۞ إِنَّ رَبَّكَ يَعْلَمُ أَنَّكَ تَقُومُ أَدْنَىٰ مِن ثُلُثَيِ ٱلَّيْلِ وَنِصْفَهُۥ وَثُلُثَهُۥ وَطَآئِفَةٌ مِّنَ ٱلَّذِينَ مَعَكَ ۚ وَٱللَّهُ يُقَدِّرُ ٱلَّيْلَ وَٱلنَّهَارَ ۚ عَلِمَ أَن لَّن تُحْصُوهُ فَتَابَ عَلَيْكُمْ ۖ فَٱقْرَءُوا۟ مَا تَيَسَّرَ مِنَ ٱلْقُرْءَانِ ۚ عَلِمَ أَن سَيَكُونُ مِنكُم مَّرْضَىٰ ۙ وَءَاخَرُونَ يَضْرِبُونَ فِى ٱلْأَرْضِ يَبْتَغُونَ مِن فَضْلِ ٱللَّهِ ۙ وَءَاخَرُونَ يُقَٰتِلُونَ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ ۖ فَٱقْرَءُوا۟ مَا تَيَسَّرَ مِنْهُ ۚ وَأَقِيمُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتُوا۟ ٱلزَّكَوٰةَ وَأَقْرِضُوا۟ ٱللَّهَ قَرْضًا حَسَنًا ۚ وَمَا تُقَدِّمُوا۟ لِأَنفُسِكُم مِّنْ خَيْرٍ تَجِدُوهُ عِندَ ٱللَّهِ هُوَ خَيْرًا وَأَعْظَمَ أَجْرًا ۚ وَٱسْتَغْفِرُوا۟ ٱللَّهَ ۖ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌۢ ﴿٢٠﴾

سورة المدثر

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

يَٰٓأَيُّهَا ٱلْمُدَّثِّرُ ﴿١﴾ قُمْ فَأَنذِرْ ﴿٢﴾ وَرَبَّكَ فَكَبِّرْ ﴿٣﴾ وَثِيَابَكَ فَطَهِّرْ ﴿٤﴾ وَٱلرُّجْزَ فَٱهْجُرْ ﴿٥﴾ وَلَا تَمْنُن تَسْتَكْثِرُ ﴿٦﴾ وَلِرَبِّكَ فَٱصْبِرْ ﴿٧﴾ فَإِذَا نُقِرَ فِى ٱلنَّاقُورِ ﴿٨﴾ فَذَٰلِكَ يَوْمَئِذٍ يَوْمٌ عَسِيرٌ ﴿٩﴾ عَلَى ٱلْكَٰفِرِينَ غَيْرُ يَسِيرٍ ﴿١٠﴾ ذَرْنِى وَمَنْ خَلَقْتُ وَحِيدًا ﴿١١﴾ وَجَعَلْتُ لَهُۥ مَالًا مَّمْدُودًا ﴿١٢﴾ وَبَنِينَ شُهُودًا ﴿١٣﴾ وَمَهَّدتُّ لَهُۥ تَمْهِيدًا ﴿١٤﴾ ثُمَّ يَطْمَعُ أَنْ أَزِيدَ ﴿١٥﴾ كَلَّآ ۖ إِنَّهُۥ كَانَ لِءَايَٰتِنَا عَنِيدًا ﴿١٦﴾ سَأُرْهِقُهُۥ صَعُودًا ﴿١٧﴾

(٢٠) بەڕاستی ئەو پەروەردگارەت چاک دەزانێت کە تۆ نزیکەی دوو بەشی شەو یاخود نیوەی یان سێیەکی هەڵدەسیت و شەونوێژ دەکەیت، هەروەها هەندێک لەوانەی کە لەگەڵتان، خوا ئەندازەی شەوو رۆژ دیاری دەکات، خوا زانیویەتی کە ئێوە هەرگیز نازانن دیاریی بکەن و ئاماری بکەن ئەگەر ئەو نەیکردایە، لەبەرئەوە تەوبەی لێوەرگرتن، جا چەندتان توانی و چۆنتان بۆ لوا لە شەونوێژو لەکاتی تردا قورئان بخوێنن و دەوری بکەنەوە، چونکە ئەو خوایە میهرەبانەودەزانێت، لەوانەیە کەسانێکتان لێ نەخۆش بکەوێت و کەسانی تریش ببن لە زەویدا بگەڕێن بەشوێن بازرگانی و فەزڵی خوادا و کەسانی تر لە داهاتوودا بجەنگن بۆ لابردنی کۆسپەکانی سەر ڕێی دینی خواو بۆ بەدەستهێنانی ڕەزامەندی ئەو، کەواتە چەندەتان بۆکرا ئەوەندە قورئان بخوێنن و نوێژەکانتان بەچاکی ئەنجام بدەن وزەکاتیش (بەو شێوەیەی دیاریکراوە) بیدەن و قەرز بەشێوەیەکی جوان بەخوا بدەن (ئەوەی بۆ خوا ببەخشرێت خوای گەورە بەقەرزێکی دادەنێت کە بەزاتی خۆی درا بێت) هەر دەست پێشکەریەکی چاکە بکەن بۆ خۆتان سبەی دەیبیننەوە لای خوا دەستان دەکەوێتەوە بە باشترو پاداشتی گەورەتر، دە داوای لێخۆشبوون هەر لەخوا بکەن و دڵنیابن ئەو خوایە لێخۆشبوو میهرەبانە.

سوورەتی (المدثر)

بەناوی خوای بەخشندە و میهرەبان

(١) ئەی ئەو کەسەی خۆت پێچاوەتەوە، ئەی محمد ﷺ

(٢) هەستە و خەڵکی بێداربکەرەوە (ڕاستیەکان روون بکەرەوە).

(٣) پەروەردگارت بەگەورە ناوببە (الله أکبر، با دروشمت بێت، مەزنی ئەو زاتە روون بکەرەوە).

(٤) پۆشاکت (دڵ و دەروونت، ڕەفتارت، هەرهەمووی) خاوێن بکە (خۆت و شوێنکەوتووانت).

(٥) بەردەوام بە لەسەر واز هێنان لە گوناه.

(٦) منەتیش مەکە (بەسەر کەسدا) چاکەو بەخشینەکانت بەزۆر مەزانە لەکاتێکدا بەتەمای زیاتر بیت.

(٧) هەوڵ بدە لەبەر خاترو ڕێزی پەروەردگارت خۆگرو ئارامگربە.

(٨) جا کاتێک فوو دەکرێت بە(صور)داو دەزگای تایبەتی لێ دەدرێت.

(٩) ئەو رۆژە رۆژێکی زۆرگران و سەختە (کە بەسەر دانیشتوانی زەویدا دێت).

(١٠) لەسەر کافران هیچ ئاسان نیە (بەڵکو زۆر سەغڵەتیان دەکات).

(١١) واز لە من و ئەو کەسە بهێنە کە بەتەنهایی (تاقانە) دروستم کردووە (هیچی نەبوو، کە وەلیدی کوڕی موغەیرەیە).

(١٢) لەوەودوا ماڵ و سامانی زۆرو زەبەندەم پێبەخشی.

(١٣) چەندەها کوڕو نەوەش کە هەمیشە ئامادەن لە نزیکیدا.

(١٤) لە هەموو کەل و پەل و نازو نیعمەتێک بەهرەوەرم کرد.

(١٥) لە پاش ئەوەش بەتەمایە بۆی زیاتر بکەم.

(١٦) نەخێر، بەڕاستی ئەو بەرامبەر فەرمانەکانی ئێمە هەر سەرکەش و کەللە ڕەق و سەرسەختە.

(١٧) ئەوسا سزای سەختی پێ ئەچێژم.

إِنَّهُۥ فَكَّرَ وَقَدَّرَ ﴿١٨﴾ فَقُتِلَ كَيْفَ قَدَّرَ ﴿١٩﴾ ثُمَّ قُتِلَ كَيْفَ قَدَّرَ ﴿٢٠﴾ ثُمَّ نَظَرَ ﴿٢١﴾ ثُمَّ عَبَسَ وَبَسَرَ ﴿٢٢﴾ ثُمَّ أَدْبَرَ وَٱسْتَكْبَرَ ﴿٢٣﴾ فَقَالَ إِنْ هَٰذَآ إِلَّا سِحْرٌ يُؤْثَرُ ﴿٢٤﴾ إِنْ هَٰذَآ إِلَّا قَوْلُ ٱلْبَشَرِ ﴿٢٥﴾ سَأُصْلِيهِ سَقَرَ ﴿٢٦﴾ وَمَآ أَدْرَىٰكَ مَا سَقَرُ ﴿٢٧﴾ لَا تُبْقِى وَلَا تَذَرُ ﴿٢٨﴾ لَوَّاحَةٌ لِّلْبَشَرِ ﴿٢٩﴾ عَلَيْهَا تِسْعَةَ عَشَرَ ﴿٣٠﴾ وَمَا جَعَلْنَآ أَصْحَٰبَ ٱلنَّارِ إِلَّا مَلَٰٓئِكَةً وَمَا جَعَلْنَا عِدَّتَهُمْ إِلَّا فِتْنَةً لِّلَّذِينَ كَفَرُوا۟ لِيَسْتَيْقِنَ ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْكِتَٰبَ وَيَزْدَادَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ إِيمَٰنًا وَلَا يَرْتَابَ ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْكِتَٰبَ وَٱلْمُؤْمِنُونَ وَلِيَقُولَ ٱلَّذِينَ فِى قُلُوبِهِم مَّرَضٌ وَٱلْكَٰفِرُونَ مَاذَآ أَرَادَ ٱللَّهُ بِهَٰذَا مَثَلًا كَذَٰلِكَ يُضِلُّ ٱللَّهُ مَن يَشَآءُ وَيَهْدِى مَن يَشَآءُ وَمَا يَعْلَمُ جُنُودَ رَبِّكَ إِلَّا هُوَ وَمَا هِىَ إِلَّا ذِكْرَىٰ لِلْبَشَرِ ﴿٣١﴾ كَلَّا وَٱلْقَمَرِ ﴿٣٢﴾ وَٱلَّيْلِ إِذْ أَدْبَرَ ﴿٣٣﴾ وَٱلصُّبْحِ إِذَآ أَسْفَرَ ﴿٣٤﴾ إِنَّهَا لَإِحْدَى ٱلْكُبَرِ ﴿٣٥﴾ نَذِيرًا لِّلْبَشَرِ ﴿٣٦﴾ لِمَن شَآءَ مِنكُمْ أَن يَتَقَدَّمَ أَوْ يَتَأَخَّرَ ﴿٣٧﴾ كُلُّ نَفْسٍۭ بِمَا كَسَبَتْ رَهِينَةٌ ﴿٣٨﴾ إِلَّآ أَصْحَٰبَ ٱلْيَمِينِ ﴿٣٩﴾ فِى جَنَّٰتٍ يَتَسَآءَلُونَ ﴿٤٠﴾ عَنِ ٱلْمُجْرِمِينَ ﴿٤١﴾ مَا سَلَكَكُمْ فِى سَقَرَ ﴿٤٢﴾ قَالُوا۟ لَمْ نَكُ مِنَ ٱلْمُصَلِّينَ ﴿٤٣﴾ وَلَمْ نَكُ نُطْعِمُ ٱلْمِسْكِينَ ﴿٤٤﴾ وَكُنَّا نَخُوضُ مَعَ ٱلْخَآئِضِينَ ﴿٤٥﴾ وَكُنَّا نُكَذِّبُ بِيَوْمِ ٱلدِّينِ ﴿٤٦﴾ حَتَّىٰٓ أَتَىٰنَا ٱلْيَقِينُ ﴿٤٧﴾

(١٨) بەراستی ئەو بیری کردەوە و پەیامەکەی هەڵسەنگاند (بەلام بەهەڵە).
(١٩) بەکوشت چێ و سەرەو نگوون بێت، چۆن هەڵسەنگاندنێکی کرد.
(٢٠) پاشان هەر بەکوشت بچێت بۆخۆی و هەڵسەنگاندنێک کە کردی بۆ قورئان.
(٢١) ئینجا بیری لێکردەوە و ورد بۆوەوتەماشای دەوروبەری کرد.
(٢٢) ئینجا ناوچاوی هێنایەوەیەک (وەک یەکێک بەقووڵێ بیربکاتەوە) ڕەش داگیرسا.
(٢٣) پاشان رووی وەرگێڕاو خۆی بەزلزانی.
(٢٤) بەهەموو عەقڵیەوە وتی!! ئەم قورئانە جگە جادوو نەبێت کەوەردەگیرێت هیچی تر نییە!!...
(٢٥) ئەمە هەر قسەی بەشەرە و هیچی تر؟!
(٢٦) (ئەو بێ‌ویژدانە بەسەریەوە ناچێت) دەبێت بیگەیەنمە ناو دۆزەخ.
(٢٧) جا تۆ نازانیت دۆزەخ چیە...
(٢٨) هیچ ئەندامێک ناهێڵێتەوە و دەست هەڵناگرێت...
(٢٩) پێستیان هەڵدەقرچێنێت و ڕەشی دەکات و دەری دەخات.
(٣٠) نۆزدە فریشتە سەرپەرشتی دۆزەخ دەکەن.
(٣١) جا ئێمە وەنەبێت کارگوزارانی دۆزەخمان لە کەسانی تر جگە لە فریشتە بەدی هێنابێت، ئەو ژمارەیەشمان تەنها بۆ تاقیکردنەوە دیاری کردووە بۆ ئەوانەی کە بێ باوەڕ بوون، هەروەها بۆ ئەوەی ئەوانەی کتێبیان پێدراوە دڵنیابن لە راستی ئەم قورئانە (چونکە لە تەورات و ئینجیلدا ئەو باسە هەیە)و بۆ ئەوەش کە ئیمانداران زیاتر باوەڕیان دامەزراو بێت و ئەوانەش کە کتێبیان پێدراوە ئیماندارانیش حەق نیە تووشی دوو دڵی ببن، با ئەوانەی دڵ و دەروونیان نەخۆشە لە دووڕووەکان و بێباوەڕان هەر بۆ خۆیان قسە بکەن و بڵێن: نیازی خوا چیە بەم ژمارەیە؟ بەو شێوەیە باسکرا خوا هەر کەسێکی بوێت گومڕای دەکات، هەر کەسێکیشی بوێت ڕێنموویی دەکات، کەس ژمارەی سەربازانی پەروەردگارت نازانێت جگە لە زاتی خۆی، ئەو ئایەت و فەرموودانە تەنها پەندو ئامۆژگارین بۆ ئادەمی.
(٣٢) نەخێر، سوێند بە مانگ (ئەو خەڵکە چاک هەستی پێ ناکەن).
(٣٣) بە شەویش کاتێک کە تێ پەڕی (زۆربەیان باوەڕیان بە قیامەت نیە).
(٣٤) بە بەرەبەیان کاتێک کە خۆی دەنوێنێت.. (زۆربەی خەڵکی غافڵە)
(٣٥) بەراستی ـ سەقەر ـ یەکێکە لە شتە سامناک و گەورە کان.
(٣٦) بۆ ترساندنی سەرجەم خەڵکانە.
(٣٧) جا ئیتر ئەوەی دەیەوێت با بەرەو پێش بچێت (پێشبرکێ بکات لە چاکەکاریدا) یان خۆی دوابخات (لەو بوارەدا).
(٣٨) چونکە لە قیامەتدا هەموو کەس بارمتەی دەستپێشکەری خۆیەتی (کردەوەکانی دێنەوە ڕێی).
(٣٩) جگە لە دەستەی راستان و ئیماندارانی کردەوە چاک.
(٤٠) لەناو بەهەشتەکاندان و پرسیار دەکەن لە یەکتر...
(٤١) لە بارەی تاوانبارانەوە...
(٤٢) ئەوە چی بوو ئێوەی راپێچی دۆزەخ کرد؟!
(٤٣) بە کەساسیەوە دەڵێن: ئێمە لە نوێژگەران نەبووین...
(٤٤) خۆراکمان بە هەژاران نەدەبەخشی...
(٤٥) ئێمە لەگەڵ دەم درێژو بێ‌ئابرووەکاندا قسەی خۆمان دەکردو لەبابەتی ئەوانمان دەگوت و ڕەخنەی بێ‌جێمان دەگرت لەگەڵیان ڕۆدەچووین.
(٤٦) ئێمە بڕوامان بە ڕۆژی پاداشت نەبوو.
(٤٧) هەتا مردن یەخەی پێگرتین و ڕۆژگاری تەمەنمان کۆتایی هات.

فَمَا تَنفَعُهُمْ شَفَٰعَةُ ٱلشَّٰفِعِينَ ﴿٤٨﴾ فَمَا لَهُمْ عَنِ ٱلتَّذْكِرَةِ مُعْرِضِينَ ﴿٤٩﴾ كَأَنَّهُمْ حُمُرٌ مُّسْتَنفِرَةٌ ﴿٥٠﴾ فَرَّتْ مِن قَسْوَرَةٍۭ ﴿٥١﴾ بَلْ يُرِيدُ كُلُّ ٱمْرِئٍ مِّنْهُمْ أَن يُؤْتَىٰ صُحُفًا مُّنَشَّرَةً ﴿٥٢﴾ كَلَّا ۖ بَل لَّا يَخَافُونَ ٱلْءَاخِرَةَ ﴿٥٣﴾ كَلَّآ إِنَّهُۥ تَذْكِرَةٌ ﴿٥٤﴾ فَمَن شَآءَ ذَكَرَهُۥ ﴿٥٥﴾ وَمَا يَذْكُرُونَ إِلَّآ أَن يَشَآءَ ٱللَّهُ ۚ هُوَ أَهْلُ ٱلتَّقْوَىٰ وَأَهْلُ ٱلْمَغْفِرَةِ ﴿٥٦﴾

سُورَةُ القِيَامَةِ

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

لَآ أُقْسِمُ بِيَوْمِ ٱلْقِيَٰمَةِ ﴿١﴾ وَلَآ أُقْسِمُ بِٱلنَّفْسِ ٱللَّوَّامَةِ ﴿٢﴾ أَيَحْسَبُ ٱلْإِنسَٰنُ أَلَّن نَّجْمَعَ عِظَامَهُۥ ﴿٣﴾ بَلَىٰ قَٰدِرِينَ عَلَىٰٓ أَن نُّسَوِّىَ بَنَانَهُۥ ﴿٤﴾ بَلْ يُرِيدُ ٱلْإِنسَٰنُ لِيَفْجُرَ أَمَامَهُۥ ﴿٥﴾ يَسْـَٔلُ أَيَّانَ يَوْمُ ٱلْقِيَٰمَةِ ﴿٦﴾ فَإِذَا بَرِقَ ٱلْبَصَرُ ﴿٧﴾ وَخَسَفَ ٱلْقَمَرُ ﴿٨﴾ وَجُمِعَ ٱلشَّمْسُ وَٱلْقَمَرُ ﴿٩﴾ يَقُولُ ٱلْإِنسَٰنُ يَوْمَئِذٍ أَيْنَ ٱلْمَفَرُّ ﴿١٠﴾ كَلَّا لَا وَزَرَ ﴿١١﴾ إِلَىٰ رَبِّكَ يَوْمَئِذٍ ٱلْمُسْتَقَرُّ ﴿١٢﴾ يُنَبَّؤُا۟ ٱلْإِنسَٰنُ يَوْمَئِذٍۭ بِمَا قَدَّمَ وَأَخَّرَ ﴿١٣﴾ بَلِ ٱلْإِنسَٰنُ عَلَىٰ نَفْسِهِۦ بَصِيرَةٌ ﴿١٤﴾ وَلَوْ أَلْقَىٰ مَعَاذِيرَهُۥ ﴿١٥﴾ لَا تُحَرِّكْ بِهِۦ لِسَانَكَ لِتَعْجَلَ بِهِۦٓ ﴿١٦﴾ إِنَّ عَلَيْنَا جَمْعَهُۥ وَقُرْءَانَهُۥ ﴿١٧﴾ فَإِذَا قَرَأْنَٰهُ فَٱتَّبِعْ قُرْءَانَهُۥ ﴿١٨﴾ ثُمَّ إِنَّ عَلَيْنَا بَيَانَهُۥ ﴿١٩﴾



(٤٨) کەواتە ئیتر تکای تکاکاران سوودیان پێ ناگەیەنێت.
(٤٩) باشە، ئەوە بۆچی لە یادخستنەوە پشت هەڵدەکەن و روو وەردەگێرن.
(٥٠) دەڵێی گەلە گوێدرێژی کێوین و دەسڵەمێنەوە...
(٥١) لە ترسی شێر هەڵهاتوون...
(٥٢) بەڵکو هەریەکێ لەوان دەیەوێت لە ئاسمانەوە چەندەها نامەی کراوەی بۆ بێت؟
(٥٣) نەخێر ئەوانە بەهیچ شتێک داناچڵەکێن بەڵکو لە دوارۆژ ناترسن.
(٥٤) نەخێر ئەوانە بەسەریانەوە ناچێت، چونکە ئەو قورئانە ئامۆژگاریە.
(٥٥) جا ئەوەی دەیەوێت با یادی بگرێت و شوێنی بکەوێت(چەندی توانی لەبەری بکات).
(٥٦) جا ئەو خەڵکە یاداوەری وەرناگرێت و بیر لەم راستیانە ناکاتەوە مەگەر ویستی خوای لەسەر بێت (کە لەگەڵ ویستی ئینسانە بەختەوەرەکاندا یەک دەکەوێت) جا هەر ئەو زاتەش شایستەی ئەوەیە کە خەڵکی حسابی بۆ بکەن و لە خەشمی بترسن و هەر ئەویش لە خۆی گرتووە کە لێخۆشبوو بێت (لە ئیماندارانی گوناهبار، کاتێک تەوبە دەکەن).

سوورەتی (القیـــامة)

بەناوی خوای بەخشندە و میهرەبان

(١) سوێند دەخۆم بە رۆژی قیامەت.
(٢) سوێند دەخۆم بە ویژدانی زیندوو و نەفسی رەخنە لە خۆگر کە لۆمەی خۆی دەکات.
(٣) ئایا ئینسان وادەزانێت هەرگیز ئێسکەکانی کۆناکەینەوە؟!
(٤) بەڵێ، لەوە زیاتریش دەکەین و توانامان هەیە کە نەخشە وردەکانی سەر پەنجەکانی بەدی بهێنینەوە.
(٥) نەخێر، باگومانی وانەبات، بەڵکو ئادەمیزاد دەیەوێت گوناهو تاوان بکاتە پیشەی خۆی بەدرێژایی ژیانی، یاخود دەیەوێت قیامەت لەبەردەمیدا بەرپا ببێت ئینجا باوەڕی پێ بهێنێت!
(٦) بێپاکانە دەپرسێت: کوا، کەی رۆژی قیامەت بەرپا دەبێت؟! (بەخەیاڵی خۆی زۆر بە دووری دەزانێت).
(٧) کاتێک دێت، چاو ئەبڵەق دەبێت.
(٨) مانگیش دەگیرێت و تاریک دەبێت (ئەویش هەڵدەوەشێت).
(٩) (یاسای بوونەوەر تێک دەچێت و) خۆر و مانگ کۆدەکرێنەوە و دەدرێن بەیەکدا.
(١٠) ئەو رۆژە ئینسان دەڵێت: (ئەی هاوار) بۆ کوێ را بکەم، لەکوێوە خۆم رزگار بکەم.
(١١) نەخێر ئیتر دەربازبوون نیە (رزگار بوون ئەستەمە).
(١٢) تۆ ئیتر دەبێت لای پەروەردگارت ئامادەبیت و لەوێ ئۆقرە بگریت (بۆ لێپرسینەوە).
(١٣) لەو رۆژەدا ئادەمیزاد هەواڵی هەموو ئەو کاروکردەوانەی پێدەدرێت کە دەست پێشکەری کردووە(یاخود بە تەما بووە بیکات و دوای خستووە، یاخود هەواڵی کردەوەی رابووردووی و ئاسەواری دوای خۆی پێ دەدرێت).
(١٤) بەڵکو ئینسان خۆی شایەتە بەسەر خۆیەوە(ئەندامەکان شایەتن بەسەریەوە).
(١٥) هەرچەندە چەندەها پاکانە بکات و بیانوو بهێنێتەوە (بێ سوود و بێ کەڵکە).
(١٦) پەلە مەکە و زمانت مەجوڵێنە، بۆ ئەوەی پەلە بکەیت لە وەرگرتنیدا.
(١٧) بەراستی لەسەر ئێمەیە کۆکردنەوە و خوێندنەوەی.
(١٨) جا کاتێک ئێمە دەیخوێنینەوە تۆش شوێنمان بکەوە لە خوێندنەوەیدا.
(١٩) پاشان بەراستی روون کردنەوەشی لەسەر ئێمەیە.

كَلَّا بَلْ تُحِبُّونَ ٱلْعَاجِلَةَ ﴿٢٠﴾ وَتَذَرُونَ ٱلْآخِرَةَ ﴿٢١﴾ وُجُوهٌ يَوْمَئِذٍ نَّاضِرَةٌ ﴿٢٢﴾
إِلَىٰ رَبِّهَا نَاظِرَةٌ ﴿٢٣﴾ وَوُجُوهٌ يَوْمَئِذٍۭ بَاسِرَةٌ ﴿٢٤﴾ تَظُنُّ أَن يُفْعَلَ بِهَا فَاقِرَةٌ ﴿٢٥﴾
كَلَّآ إِذَا بَلَغَتِ ٱلتَّرَاقِيَ ﴿٢٦﴾ وَقِيلَ مَنْۜ رَاقٍ ﴿٢٧﴾ وَظَنَّ أَنَّهُ ٱلْفِرَاقُ ﴿٢٨﴾ وَٱلْتَفَّتِ
ٱلسَّاقُ بِٱلسَّاقِ ﴿٢٩﴾ إِلَىٰ رَبِّكَ يَوْمَئِذٍ ٱلْمَسَاقُ ﴿٣٠﴾ فَلَا صَدَّقَ وَلَا صَلَّىٰ
﴿٣١﴾ وَلَٰكِن كَذَّبَ وَتَوَلَّىٰ ﴿٣٢﴾ ثُمَّ ذَهَبَ إِلَىٰٓ أَهْلِهِۦ يَتَمَطَّىٰٓ ﴿٣٣﴾ أَوْلَىٰ لَكَ
فَأَوْلَىٰ ﴿٣٤﴾ ثُمَّ أَوْلَىٰ لَكَ فَأَوْلَىٰٓ ﴿٣٥﴾ أَيَحْسَبُ ٱلْإِنسَٰنُ أَن يُتْرَكَ سُدًى ﴿٣٦﴾
أَلَمْ يَكُ نُطْفَةً مِّن مَّنِيٍّ يُمْنَىٰ ﴿٣٧﴾ ثُمَّ كَانَ عَلَقَةً فَخَلَقَ فَسَوَّىٰ ﴿٣٨﴾ فَجَعَلَ مِنْهُ
ٱلزَّوْجَيْنِ ٱلذَّكَرَ وَٱلْأُنثَىٰٓ ﴿٣٩﴾ أَلَيْسَ ذَٰلِكَ بِقَٰدِرٍ عَلَىٰٓ أَن يُحْـِۧىَ ٱلْمَوْتَىٰ ﴿٤٠﴾

سُورَةُ الإِنسَانِ

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

هَلْ أَتَىٰ عَلَى ٱلْإِنسَٰنِ حِينٌ مِّنَ ٱلدَّهْرِ لَمْ يَكُن شَيْـًٔا مَّذْكُورًا ﴿١﴾
إِنَّا خَلَقْنَا ٱلْإِنسَٰنَ مِن نُّطْفَةٍ أَمْشَاجٍ نَّبْتَلِيهِ فَجَعَلْنَٰهُ سَمِيعًۢا
بَصِيرًا ﴿٢﴾ إِنَّا هَدَيْنَٰهُ ٱلسَّبِيلَ إِمَّا شَاكِرًا وَإِمَّا كَفُورًا ﴿٣﴾
إِنَّآ أَعْتَدْنَا لِلْكَٰفِرِينَ سَلَٰسِلَا۟ وَأَغْلَٰلًا وَسَعِيرًا ﴿٤﴾ إِنَّ
ٱلْأَبْرَارَ يَشْرَبُونَ مِن كَأْسٍ كَانَ مِزَاجُهَا كَافُورًا ﴿٥﴾

سكتة لطيفة على النون

(٢٠) نەخێر، وانی‌یە (زیندووکردنـەوە لێپرسینەوە هەر دەبێت) دیارە ئێوە هەر ئـەم دنیایـەتان خۆش دەوێت کەبەپەلە بەسەر دەچێت.
(٢١) قیامەت و بەهەشت پشتگوێ دەخەن و وازی لێدەهێنن.
(٢٢) بەمـەرجێک ئـەو ڕۆژە، ڕووخسـارانێک گەشاوە و ناسک و ئاسوودەن.
(٢٣) چونکـە (هەریەکـە بـۆ خـۆی) تەماشـای پەروەردگاری دەکات (لە تەماشاکردنی تێر نابێت).
(٢٤) هەر لـەو ڕۆژەشـدا ڕووخسـارانێکی تـر رەش داگیرساو گرژو تاڵ و دێزن.
(٢٥) چاوەڕوانن کارەسـاتێکی پشـت شـکێنیان بەسەردا بهێنرێت.
(٢٦) نەخێر ئەو خەڵکـە هـەروا ژیانیـان بـەردەوام نابێت بەڵکو کاتێک دێت کە ڕۆحی یەک بەیەکەیان دەگاتە گەرووی.
(٢٧) ئەوسا دەوترێت، کێ فریاد ڕەسیەتی؟
(٢٨) بـەڵام لـەو کاتـەدا، ئـەو کەسـەی لەسـەرە مەرگدایـە دڵنیایـە کـە ئیتر هیـچ شـتێک فریـای ناکەوێت و کاتی ماڵئاواییە.
(٢٩) ئیتر قاچ و لوولاق بەیەکدا دەئاڵێن.
(٣٠) ئەوساو لـەو ڕۆژەدا بـۆ لای پـەروەردگارت ڕاپێچ دەکرێیت و دەبرێیت.
(٣١) نەبڕوای هێناو نەنوێژێکی بەجوانی خوێند.
(٣٢) بەڵکو بڕوای نەهێناو پشتی تێکرد.
(٣٣) پاشان هەمووجار بەلەنجەو لارو خۆبادانـەوە دەگەڕایەوە بۆ ناو کەسوکاری و کەشخەی دەکرد.
(٣٤) (جا ئەم دۆزەخە) بۆ تۆ شیاوترە و لەبارترە.
(٣٥) پاشان هەرئەو سزایە بۆتۆ شیاوترەو لەبارترە.
(٣٦) ئایا ئادەمیزاد وادەزانێت هەروا وازی لێدەهێنرێت بەخۆڕایی (لێپرسینەوەی نابێت؟!).
(٣٧) باشە، ئایا کاتی خۆی نوتفەیەک نەبووە لەمەنی کە دەڕژێنرایە شوێنی خۆی (کە منداڵدانی دایکە).
(٣٨) پاشان خۆهەڵواسرێک بوو گەشەی کردوو و ڕۆح و دەزگاکانی دەرەوە و ناوەوەی بەرێکوپێکی پێبەخشی.
(٣٩) ئینجا هەر لەو مەنی‌یە هەردوو جووت نێرو مێی دروست کردووە (کە تەواوکاری یەکترن).
(٤٠) ئایا ئەو زاتەی ئەوە بکات ناتوانێت مردووەکان زیندوو بکاتەوە؟!

سوورەتی (الإنسـان)

بەناوی خوای بەخشندە و میهرەبان

(١) بەڕاستی ماوەیەکی زۆر لە ڕۆژگار بەسەر ئادەمیزادا هات کە شتێکی وانەبوو ناو ببرێت.
(٢) بێگومان ئێمە ئینسـانمان دروستکرد لـە تێکەڵەیـەک (لـە سـەرەمێکوتەیەکی بچـووک و هێلکۆکەیـەک) لـەکاتێکدا دەمانەوێت تاقی بکەینەوە، هەر بۆیە دەزگای بیستن و بینینمان پێبەخشی.
(٣) بەڕاستی ئێمە ڕێنموویمان کرد بۆ ڕێگەی ڕاست، بەئازادی دەتوانێت ببێتە کەسایەتیەکی ئیماندارو سوپاسگوزار، یان بێباوەڕو خوانەناس.
(٤) بەڕاستی با بزانێت کە ئێمە چەندەها کۆت و زنجیرو ئاگری هەڵگیرساومان ئامادەکردووە بۆ بێباوەڕان.
(٥) بێگومان چاکان و پاکانیش لە پەرداخێکی پڕ شەرابدا دەخۆنەوە، کە ئاوێتەکەی لەسەرچاوەی کافوورەوەیە.

عَيْنًا يَشْرَبُ بِهَا عِبَادُ اللَّهِ يُفَجِّرُونَهَا تَفْجِيرًا ﴿٦﴾ يُوفُونَ بِالنَّذْرِ وَيَخَافُونَ يَوْمًا كَانَ شَرُّهُ مُسْتَطِيرًا ﴿٧﴾ وَيُطْعِمُونَ الطَّعَامَ عَلَىٰ حُبِّهِ مِسْكِينًا وَيَتِيمًا وَأَسِيرًا ﴿٨﴾ إِنَّمَا نُطْعِمُكُمْ لِوَجْهِ اللَّهِ لَا نُرِيدُ مِنكُمْ جَزَاءً وَلَا شُكُورًا ﴿٩﴾ إِنَّا نَخَافُ مِن رَّبِّنَا يَوْمًا عَبُوسًا قَمْطَرِيرًا ﴿١٠﴾ فَوَقَاهُمُ اللَّهُ شَرَّ ذَٰلِكَ الْيَوْمِ وَلَقَّاهُمْ نَضْرَةً وَسُرُورًا ﴿١١﴾ وَجَزَاهُم بِمَا صَبَرُوا جَنَّةً وَحَرِيرًا ﴿١٢﴾ مُّتَّكِئِينَ فِيهَا عَلَى الْأَرَائِكِ لَا يَرَوْنَ فِيهَا شَمْسًا وَلَا زَمْهَرِيرًا ﴿١٣﴾ وَدَانِيَةً عَلَيْهِمْ ظِلَالُهَا وَذُلِّلَتْ قُطُوفُهَا تَذْلِيلًا ﴿١٤﴾ وَيُطَافُ عَلَيْهِم بِآنِيَةٍ مِّن فِضَّةٍ وَأَكْوَابٍ كَانَتْ قَوَارِيرَا ﴿١٥﴾ قَوَارِيرَ مِن فِضَّةٍ قَدَّرُوهَا تَقْدِيرًا ﴿١٦﴾ وَيُسْقَوْنَ فِيهَا كَأْسًا كَانَ مِزَاجُهَا زَنجَبِيلًا ﴿١٧﴾ عَيْنًا فِيهَا تُسَمَّىٰ سَلْسَبِيلًا ﴿١٨﴾ ۞ وَيَطُوفُ عَلَيْهِمْ وِلْدَانٌ مُّخَلَّدُونَ إِذَا رَأَيْتَهُمْ حَسِبْتَهُمْ لُؤْلُؤًا مَّنثُورًا ﴿١٩﴾ وَإِذَا رَأَيْتَ ثَمَّ رَأَيْتَ نَعِيمًا وَمُلْكًا كَبِيرًا ﴿٢٠﴾ عَالِيَهُمْ ثِيَابُ سُندُسٍ خُضْرٌ وَإِسْتَبْرَقٌ وَحُلُّوا أَسَاوِرَ مِن فِضَّةٍ وَسَقَاهُمْ رَبُّهُمْ شَرَابًا طَهُورًا ﴿٢١﴾ إِنَّ هَٰذَا كَانَ لَكُمْ جَزَاءً وَكَانَ سَعْيُكُم مَّشْكُورًا ﴿٢٢﴾ إِنَّا نَحْنُ نَزَّلْنَا عَلَيْكَ الْقُرْآنَ تَنزِيلًا ﴿٢٣﴾ فَاصْبِرْ لِحُكْمِ رَبِّكَ وَلَا تُطِعْ مِنْهُمْ آثِمًا أَوْ كَفُورًا ﴿٢٤﴾ وَاذْكُرِ اسْمَ رَبِّكَ بُكْرَةً وَأَصِيلًا ﴿٢٥﴾



(٦) کە کانییەکە بەندەکانی خوا لێی دەخۆنەوە لە هەر شوێنێکدا بیانەوێت هەڵی دەقوڵێنن و فوارە دەکات.

(٧) ئەو بەختەوەرانە، یەکێک لە سیفاتیان ئەوەیە: وەفا بەنەزر دەکەن، یاخود بەڵێنێکیاندا وەفادارن و ئەنجامی دەدەن و بیمیان هەیە لە رۆژێک کە شەڕی لی دەبارێت و پرشو بلاوە...

(٨) هەروەها نان و خۆراک دەبەخشن، ئەگەرچی خۆشەویستیش بێت لایان، بەهەژارو هەتیوو دیلەکان.

(٩) دەڵێن: بێگومان ئێمە ئەم خۆراکەتان هەر لەبەر خواو بۆ بەدەستهێنانی رەزامەندی ئەو پێدەبەخشین، نەپاداشتمان لێتان دەوێت نەسوپاس.

(١٠) هەروەها دەڵێن: ئەم کارە بۆیە دەکەین چونکە لە رۆژێکی تاڵ و گرژو رەش و تاریک دەترسین، کە پەروەردگارمان پێشی دەهێنێت.

(١١) جا خوای گەورەش لە شەڕو ناخۆشی و نەهامەتی ئەو رۆژە پاراستنی و رووی گەش و شادمانی پێبەخشین.

(١٢) لە پاداشتی خۆگری و نارامگریاندا بەهەشت و ئاوریشمی پێبەخشین.

(١٣) ئەو بەختەوەرانە لەسەر کورسی و قەنەفە رازاوەکان شانیان داداوە، نەگەرمای خۆر بێزاریان دەکات، نە کزەبا و سەرما سەغڵەتیان دەکات.

(١٤) سێبەری درەختە جوانەکان بەسەر شوێنە خۆشەکانیاندا سەری فرو هێناوە و لێکردنەوەی میوەکانیش ئاسانە و ملکەچ کراوە.

(١٥) هەروەها لە سوراحی و دۆلکەی زیودا شەرابیان بۆ دەگێرن کە دەکرێتە ئەو کوپ و پەرداخانەوە کە لە شووشە و کریستاڵی تایبەت دروستکراون.

(١٦) هەموو دام و دەزگای خواردن و خواردنەوەکان لە شووشەی زیوی دروستکراون بەشێوەیەکی جوان و دڵڕفێن.

(١٧) هەروەها شەرابێکی تریان پێشکەش دەکرێت کە ئاوێتەکەی زەنجەبیلە.

(١٨) کە سەرچاوەیەکە لە بەهەشتدا بە سەلسەبیل ناو دەبرێت.

(١٩) ئینجا نەوجەوانانی هەمیشە لاو و رووخۆش و جوان و پاک، بەناویاندا دەگەڕێن (قسەی خۆش و سروودی بەتام دەڵێن) کاتێک دەیانبینیت وا دەزانیت مروارین و بەو ناوەدا بلاوبوونەتەوە.

(٢٠) کاتێکیش بەهەر لایەکدا چاودەگێڕیت، ئەوە نازو نیعمەتی نەبڕاوە و بێئەندازو دەسەلاتێکی گەورە دەبینیت لە باخ و باخات و کۆشک و تەلارو دیمەنی جوان و فراوانی بێسنوور.

(٢١) پۆشاکی بەختەوەران ئاوریشمی سەوزی تەنکە کە بەسەر پۆشاکی ئاوریشمی ئەستووردا لەبەریان کردووە، بەبازنی زیوی رازێنراونەتەوە، ئینجا لەلایەن پەروەردگاریانەوە شەرابی پاک و بێگەرد و خاوێنیان پێشکەش کراوە.

(٢٢) پاشان پەروەردگاریان پێیان دەفەرموێت: بەڕاستی ئەم پاداشتە شایستەی ئێوەیە، هەوڵ و کۆشش و کاروکردەوەی ئێوە شایانی سوپاس و رێزە.. (بێگومان خوای گەورە بەم سوپاسگوزاریە ئەوەندەی تر بەختەوەران و دڵخۆش دەکات).

(٢٣) دڵنیاش بە ئەی محمد ﷺ هەر ئێمە قورئانمان بۆ تۆ دابەزاندووە بەش بەش (تا خەڵکی پێ بێدار بکەیتەوە).

(٢٤) کەواتە خۆڕاگربە بۆ فەرمانی پەروەردگارت، نەکەیت ملکەچ و فەرمانبەرداری تاوانباران و بێباوەڕان بیت لەوان.

(٢٥) ئینجا بەردەوام یادی پەروەردگارت بکە و ناوی پیرۆزی با ویردی سەرزارت بێت، لە بەرەبەیان و دەمەو ئێواراندا.

وَمِنَ ٱلَّيۡلِ فَٱسۡجُدۡ لَهُۥ وَسَبِّحۡهُ لَيۡلٗا طَوِيلًا ﴿٢٦﴾ إِنَّ
هَٰٓؤُلَآءِ يُحِبُّونَ ٱلۡعَاجِلَةَ وَيَذَرُونَ وَرَآءَهُمۡ يَوۡمٗا ثَقِيلٗا ﴿٢٧﴾ نَّحۡنُ
خَلَقۡنَٰهُمۡ وَشَدَدۡنَآ أَسۡرَهُمۡۖ وَإِذَا شِئۡنَا بَدَّلۡنَآ أَمۡثَٰلَهُمۡ تَبۡدِيلًا
﴿٢٨﴾ إِنَّ هَٰذِهِۦ تَذۡكِرَةٞۖ فَمَن شَآءَ ٱتَّخَذَ إِلَىٰ رَبِّهِۦ سَبِيلٗا ﴿٢٩﴾
وَمَا تَشَآءُونَ إِلَّآ أَن يَشَآءَ ٱللَّهُۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلِيمًا حَكِيمٗا ﴿٣٠﴾
يُدۡخِلُ مَن يَشَآءُ فِي رَحۡمَتِهِۦۚ وَٱلظَّٰلِمِينَ أَعَدَّ لَهُمۡ عَذَابًا أَلِيمَۢا ﴿٣١﴾

## سُورَةُ المُرسَلَات

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

وَٱلۡمُرۡسَلَٰتِ عُرۡفٗا ﴿١﴾ فَٱلۡعَٰصِفَٰتِ عَصۡفٗا ﴿٢﴾ وَٱلنَّٰشِرَٰتِ نَشۡرٗا ﴿٣﴾
فَٱلۡفَٰرِقَٰتِ فَرۡقٗا ﴿٤﴾ فَٱلۡمُلۡقِيَٰتِ ذِكۡرًا ﴿٥﴾ عُذۡرًا أَوۡ نُذۡرًا ﴿٦﴾ إِنَّمَا
تُوعَدُونَ لَوَٰقِعٞ ﴿٧﴾ فَإِذَا ٱلنُّجُومُ طُمِسَتۡ ﴿٨﴾ وَإِذَا ٱلسَّمَآءُ فُرِجَتۡ
﴿٩﴾ وَإِذَا ٱلۡجِبَالُ نُسِفَتۡ ﴿١٠﴾ وَإِذَا ٱلرُّسُلُ أُقِّتَتۡ ﴿١١﴾ لِأَيِّ يَوۡمٍ أُجِّلَتۡ
﴿١٢﴾ لِيَوۡمِ ٱلۡفَصۡلِ ﴿١٣﴾ وَمَآ أَدۡرَىٰكَ مَا يَوۡمُ ٱلۡفَصۡلِ ﴿١٤﴾ وَيۡلٞ يَوۡمَئِذٖ
لِّلۡمُكَذِّبِينَ ﴿١٥﴾ أَلَمۡ نُهۡلِكِ ٱلۡأَوَّلِينَ ﴿١٦﴾ ثُمَّ نُتۡبِعُهُمُ ٱلۡأٓخِرِينَ
﴿١٧﴾ كَذَٰلِكَ نَفۡعَلُ بِٱلۡمُجۡرِمِينَ ﴿١٨﴾ وَيۡلٞ يَوۡمَئِذٖ لِّلۡمُكَذِّبِينَ ﴿١٩﴾

(٢٦) لەشەوگاریشدا سوژدەی بۆ ببە و تەسبیحات و ستایشی لە هەندێکی شەودا زۆر بکە.
(٢٧) بەڕاستی زۆربەی ئەو خەڵکە سەرگەردانە حەزیان لە ژیانی ئەم دنیا تەمەن کۆتایەیە کە بەخێرایی تێ دەپەڕێت و ڕۆژێکی سەخت و سەنگین پشتگوێ دەخەن و حسابی بۆ ناکەن.
(٢٨) بۆ بیرناکەنەوە، خۆ هەر ئێمە دروستمان کردوون ئەندامەکانی لەشیانمان پێکەوە بەستووە، کاتێکیش بمانەوێت ئەمانە لادەبەین و بەکەسانی تر سەر زەوی ئاوەدان دەکەینەوە.
(٢٩) بەڕاستی ئەم سوورەتە و سەرجەم ئایەتەکانی قورئان ئامۆژگارییە، جا ئەوەی ئارەزووی بەهەشتی هەیە، ئەوە بۆ لای خوا ڕێگەو ڕێباز دەگرێتە بەر.
(٣٠) دڵنیاش بن: ئێوە هیچتان پێناکرێت و هیچ کارێکتان پێ ئەنجام نادرێت مەگەر خوا ویستی لەسەربێت، بێگومان ئەوخوایە زاناو دانایە دەزانێت کێ شایستەی هیدایەتە، داناشە لە هیدایەتدانی بەندە چاکەکاندا.
(٣١) ئینجا ئەو کەسەی خوا بیەوێت و خۆیشی هەوڵبدات، دەیخاتە ژێر سایەی ڕەحمەتی خۆیەوە و بۆ ستەمکارانیش سزای بەئێشی ئامادە کردووە.

سوورەتی (المرسلات)

بەناوی خوای بەخشندە و میهرەبان

(١) سوێند بەو فریشتانەی بەکاری چاک و دروست و فەرمانبەرداریی هەڵدەستن یەک لەدوای یەک.
(٢) هەروەها ئەوانەی کە بەگوڕج وگوڵی وخێرایی فەرمانەکانی خوا بەجێ دەهێنن، یاخود بەو بایانەی هەڵدەکەن و شارو دێهاتی خوانەناسان کاول دەکەن.
(٣) بەو فریشتانەش کە هەور بڵاو دەکەنەوە، یاخود هەموو شتێکی کۆ بڵاوە پێ دەکەن.
(٤) بەوانەش کە حەق و ناحەق لێک جیادەکەنەوە.
(٥) بەو فریشتانەش کە پەیامی خوا دەگەیەنن بەخەڵکی و لە خزمەتی جوبرەئیلدا قورئانیان دەگەیاند.
(٦) بۆ ئەوەی بەڵگە بخەنە دەست ئیمانداران، نەفامانیش بێداربکەنەوە.
(٧) بەڕاستی ئەم بەڵێن و وادانەی پێتان دەدرێت هەر پێش دێت.
(٨) جا کاتێک دێت ئەستێرەکان روناکییان نامێنێت.
(٩) ئاسمانیش لەت دەبێت و لێک دەترازێت.
(١٠) کاتێک کێوەکان هەڵدەتەکێنرێن و لەجێی خۆیان نامێنن و وردوخاش دەبن.
(١١) هەروەها کاتێک دێت پێغەمبەران کات و شوێنی دیاری کراویان بۆ دادەنرێت (ڕووبەڕووی قەومەکانیان دەکرێنەوە).
(١٢) ئاخۆ دەزانن خەڵکینە لێپرسینەوە بۆ چ ڕۆژێک دواخراوە؟!
(١٣) بێگومان بۆ ڕۆژی جیاکردنەوە و دادگاییەکی ڕەوا.
(١٤) جا تۆ چووزانی ڕۆژی جیاکردنەوە و دادگایی چ ڕۆژێکی سەخت و دژوارە.
(١٥) هاوارو ئاهو ناڵە لەو ڕۆژەدا بۆ ئەوانەی کە بڕوایان بە پێغەمبەران و قیامەت و لێپرسینەوە نەبوو.
(١٦) باشە، ئەوە نابینن چۆن پێشینانمان لەناو بردووە؟
(١٧) پاشان دواییینەکانیش بەشوێنیاندا لەناو دەبەین.
(١٨) هەر بەو شێوەیەش دەکەین لەگەڵ تاوانباراندا.
(١٩) سەیری ئایەتی ١٥ بکە.

أَلَمْ نَخْلُقكُّم مِّن مَّآءٍ مَّهِينٍ ﴿٢٠﴾ فَجَعَلْنَٰهُ فِى قَرَارٍ مَّكِينٍ ﴿٢١﴾ إِلَىٰ قَدَرٍ مَّعْلُومٍ ﴿٢٢﴾ فَقَدَرْنَا فَنِعْمَ ٱلْقَٰدِرُونَ ﴿٢٣﴾ وَيْلٌ يَوْمَئِذٍ لِّلْمُكَذِّبِينَ ﴿٢٤﴾ أَلَمْ نَجْعَلِ ٱلْأَرْضَ كِفَاتًا ﴿٢٥﴾ أَحْيَآءً وَأَمْوَٰتًا ﴿٢٦﴾ وَجَعَلْنَا فِيهَا رَوَٰسِىَ شَٰمِخَٰتٍ وَأَسْقَيْنَٰكُم مَّآءً فُرَاتًا ﴿٢٧﴾ وَيْلٌ يَوْمَئِذٍ لِّلْمُكَذِّبِينَ ﴿٢٨﴾ ٱنطَلِقُوٓا۟ إِلَىٰ مَا كُنتُم بِهِۦ تُكَذِّبُونَ ﴿٢٩﴾ ٱنطَلِقُوٓا۟ إِلَىٰ ظِلٍّ ذِى ثَلَٰثِ شُعَبٍ ﴿٣٠﴾ لَّا ظَلِيلٍ وَلَا يُغْنِى مِنَ ٱللَّهَبِ ﴿٣١﴾ إِنَّهَا تَرْمِى بِشَرَرٍ كَٱلْقَصْرِ ﴿٣٢﴾ كَأَنَّهُۥ جِمَٰلَتٌ صُفْرٌ ﴿٣٣﴾ وَيْلٌ يَوْمَئِذٍ لِّلْمُكَذِّبِينَ ﴿٣٤﴾ هَٰذَا يَوْمُ لَا يَنطِقُونَ ﴿٣٥﴾ وَلَا يُؤْذَنُ لَهُمْ فَيَعْتَذِرُونَ ﴿٣٦﴾ وَيْلٌ يَوْمَئِذٍ لِّلْمُكَذِّبِينَ ﴿٣٧﴾ هَٰذَا يَوْمُ ٱلْفَصْلِ جَمَعْنَٰكُمْ وَٱلْأَوَّلِينَ ﴿٣٨﴾ فَإِن كَانَ لَكُمْ كَيْدٌ فَكِيدُونِ ﴿٣٩﴾ وَيْلٌ يَوْمَئِذٍ لِّلْمُكَذِّبِينَ ﴿٤٠﴾ إِنَّ ٱلْمُتَّقِينَ فِى ظِلَٰلٍ وَعُيُونٍ ﴿٤١﴾ وَفَوَٰكِهَ مِمَّا يَشْتَهُونَ ﴿٤٢﴾ كُلُوا۟ وَٱشْرَبُوا۟ هَنِيٓـًٔا بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴿٤٣﴾ إِنَّا كَذَٰلِكَ نَجْزِى ٱلْمُحْسِنِينَ ﴿٤٤﴾ وَيْلٌ يَوْمَئِذٍ لِّلْمُكَذِّبِينَ ﴿٤٥﴾ كُلُوا۟ وَتَمَتَّعُوا۟ قَلِيلًا إِنَّكُم مُّجْرِمُونَ ﴿٤٦﴾ وَيْلٌ يَوْمَئِذٍ لِّلْمُكَذِّبِينَ ﴿٤٧﴾ وَإِذَا قِيلَ لَهُمُ ٱرْكَعُوا۟ لَا يَرْكَعُونَ ﴿٤٨﴾ وَيْلٌ يَوْمَئِذٍ لِّلْمُكَذِّبِينَ ﴿٤٩﴾ فَبِأَىِّ حَدِيثٍ بَعْدَهُۥ يُؤْمِنُونَ ﴿٥٠﴾

(٢٠) ئەی ئەوە بۆ سەرنج نادەن، ئایا ئێوەمان لە ئاوێکی بێ نرخ دروست نەکردووە؟!
(٢١) ئینجا لە جێی مەحکەم و قایمدا نوتفەمان دانەناوە؟!
(٢٢) بۆ ماوەیەکی دیاریکراو؟!
(٢٣) ئینجا ئێمە دەسەڵاتدار بووین بەسەر ئەواندا، ئای چ دەسەڵاتدارێکی چاکین.
(٢٤) سەیری ئایەتی ١٥ بکە.
(٢٥) ئایا ئێمە زەویمان نەکردووە بەهۆکاری کۆ کردنەوە.
(٢٦) بۆ زیندووان و مردووان.
(٢٧) هەروەها لەسەر گۆی زەوی کێوی لوتکە بڵندمان دامەزراندووە و ئاوی سازگارمان پێشکەش نەکردوون بۆ خواردنەوە؟!
(٢٨) سەیری ئایەتی ١٥ بکە.
(٢٩) دەی کەواتە ئەی خوانەناسان هەستن وڕاکەن بۆ ئەو شوێنەی بڕواتان پێی نەبوو بەدرۆتان دەزانی.
(٣٠) ڕاکەن؛ دەرچن بۆ سێبەری ئەو دووکەڵە سێ برگەیە.
(٣١) نە سێبەرە (تا لەسایەیدا بحەوێنەوە) نە لە بڵێسەی ئاگری دۆزەخ دەتانپارێزێت.
(٣٢) بەڕاستی ئەو ئاگرە بڵێسەیەک فڕێ دەدات وەک کۆشک و تەلارێکی گەورە، مەزنە.
(٣٣) هەر وەکو وشتری زەردی مەیلەو رەش دەنوێنێت.
(٣٤) سەیری ئایەتی ١٥ بکە.
(٣٥) ئەمڕۆ ئیتر ئەو ڕۆژەیە کە قسەیان نەماوە و ورتەیان لێ نایەت.
(٣٦) مۆڵەتیش نادرێن پاکانە بکەن.
(٣٧) سەیری ئایەتی ١٥ بکە.
(٣٨) ئەمە ئیتر ڕۆژی جیاکردنەوەیە، ئێوەمان لەگەڵ هەموو نەوەکانی پێشوودا کۆکردۆتەوە.
(٣٩) جا ئەگەر دەتوانن نەخشەیەک، فێڵێک ئەنجام بدەن دژی من ئەنجامی بدەن.
(٤٠) سەیری ئایەتی ١٥ بکە.
(٤١) لەولاشەوە بەڕاستی دیندارو پارێزکاران، وان لە ژێر سێبەردا، لە پاڵ کانیاو و تاڤگەکاندا.
(٤٢) لە هەر جۆرە میوەیەک کە ئارەزووی بکەن بۆیان ئامادەیە و پێشکەشیان دەکرێت.
(٤٣) پێیان دەوترێت بخۆن و بخۆنەوە، نۆشتان بێت لە پاداشتی ئەو کارو کردەوە چاکانەدا کە ئەنجامتان دەدا.
(٤٤) بێگومان ئێمە ئا بەو شێوەیە پاداشتی چاکەخوازان دەدەینەوە.
(٤٥) سەیری ئایەتی ١٥ بکە.
(٤٦) ئێوەش ئەی خوانەناسان، لە دنیادا بخۆن و کەمێک ڕابوێرن، بەڕاستی ئێوە تاوانبارو تاوانکارن.
(٤٧) سەیری ئایەتی ١٥ بکە.
(٤٨) خۆ ئەگەر پێیان بوترێت، کڕنوش بەرن و ملکەچ و فەرمانبەرداری خوا بن، ئەوانە کڕنووش نابەن و ملکەچ نابن.
(٤٩) سەیری ئایەتی ١٥ بکە.
(٥٠) باشە ئەو دڵڕەقانە، ئەگەر بەم قورئانە باوەڕ ناکەن، بە چ گوفتارێکی تر باوەڕ دەکەن و ئیمان دەهێنن؟!

## سُورَةُ النَّبَإِ

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

عَمَّ يَتَسَاءَلُونَ ﴿١﴾ عَنِ النَّبَإِ الْعَظِيمِ ﴿٢﴾ الَّذِي هُمْ فِيهِ مُخْتَلِفُونَ ﴿٣﴾
كَلَّا سَيَعْلَمُونَ ﴿٤﴾ ثُمَّ كَلَّا سَيَعْلَمُونَ ﴿٥﴾ أَلَمْ نَجْعَلِ الْأَرْضَ مِهَادًا ﴿٦﴾
وَالْجِبَالَ أَوْتَادًا ﴿٧﴾ وَخَلَقْنَاكُمْ أَزْوَاجًا ﴿٨﴾ وَجَعَلْنَا نَوْمَكُمْ سُبَاتًا
﴿٩﴾ وَجَعَلْنَا اللَّيْلَ لِبَاسًا ﴿١٠﴾ وَجَعَلْنَا النَّهَارَ مَعَاشًا ﴿١١﴾ وَبَنَيْنَا
فَوْقَكُمْ سَبْعًا شِدَادًا ﴿١٢﴾ وَجَعَلْنَا سِرَاجًا وَهَّاجًا ﴿١٣﴾ وَأَنزَلْنَا
مِنَ الْمُعْصِرَاتِ مَاءً ثَجَّاجًا ﴿١٤﴾ لِّنُخْرِجَ بِهِ حَبًّا وَنَبَاتًا ﴿١٥﴾ وَجَنَّاتٍ
أَلْفَافًا ﴿١٦﴾ إِنَّ يَوْمَ الْفَصْلِ كَانَ مِيقَاتًا ﴿١٧﴾ يَوْمَ يُنفَخُ فِي الصُّورِ
فَتَأْتُونَ أَفْوَاجًا ﴿١٨﴾ وَفُتِحَتِ السَّمَاءُ فَكَانَتْ أَبْوَابًا ﴿١٩﴾ وَسُيِّرَتِ
الْجِبَالُ فَكَانَتْ سَرَابًا ﴿٢٠﴾ إِنَّ جَهَنَّمَ كَانَتْ مِرْصَادًا ﴿٢١﴾ لِّلطَّاغِينَ
مَآبًا ﴿٢٢﴾ لَّابِثِينَ فِيهَا أَحْقَابًا ﴿٢٣﴾ لَّا يَذُوقُونَ فِيهَا بَرْدًا وَلَا شَرَابًا
﴿٢٤﴾ إِلَّا حَمِيمًا وَغَسَّاقًا ﴿٢٥﴾ جَزَاءً وِفَاقًا ﴿٢٦﴾ إِنَّهُمْ كَانُوا
لَا يَرْجُونَ حِسَابًا ﴿٢٧﴾ وَكَذَّبُوا بِآيَاتِنَا كِذَّابًا ﴿٢٨﴾ وَكُلَّ شَيْءٍ
أَحْصَيْنَاهُ كِتَابًا ﴿٢٩﴾ فَذُوقُوا فَلَن نَّزِيدَكُمْ إِلَّا عَذَابًا ﴿٣٠﴾

الجزء ٣٠ الحزب ٥٩

**سوورەتی (النبـأ)**

**بەناوی خوای بەخشندە و میهرەبان**

(١) (ئەو خەڵکە) دەربارەی چی لە یەکتر دەپرسن؟
(٢) دەربارەی هەواڵە گەورە و گرنگەکە!!(کە ڕۆژی قیامەتە)
(٣) لەحاڵێکدا کە ئەوانە ڕاو بۆچوونیان جیاوازە دەربارەی.
(٤) نەخێر، وابۆیان نالوێت، لەداهاتوویەکی نزیکدا خۆیان دەبیننەوە و هەموو ڕاستیەکانیان بۆ دەردەکەوێت.
(٥) بەڵێ! لەوەودوا، لە داهاتویەکی نزیکدا خۆیان دەبیننەوە و ڕاستیەکانیان بۆ دەردەکەوێت.
(٦) (پێش باسی قیامەت پەروەردگار گەشتێکیان بەناو دروستکراوان و دیاردەکاندا پێدەکات ودەپرسێت: ئایا زەویمان وەک لانکە بۆ فەراهەم نەهێناوە؟
(٧) (ئایا) کێوەکانمان وەک مێخ بۆ دانەکوتاون؟(تا زەوی بپارێزرێت لە فشاری بورکان و ماددە تواوەکانی ناوناخی، هەروەها تا لەنگەری ڕابگرێت و چەندەها سوودی ترتان پێ بگەیەنێت).
(٨) (ئایا) ئێوەمان بە جووت دروست نەکردووە؟
(٩) خەوتنمان بۆ نەکردوون بەهۆی سرەوتن؟
(١٠) (ئایا) شەوگارمان بۆ نەکردوون بەداپۆشەر وەک پۆشاک، تاتیایدا بشاردرێنەوە؟
(١١) (ئایا) ڕۆژیشمان بۆ نەکردوونەتە کاتی بەدەستهێنانی رزق و ڕۆزی؟
(١٢) (ئایا) حەوت چین ئاسمانی بەهێزو پتەومان بە ڕا سەرتانەوە دروست نەکردووە؟
(١٣) چرایەکی پرشنگدارمان بۆ فەراهەم نەهێناون؟ (کە مەبەست خۆرە)
(١٤) (ئایا) لە هەورە گوشراوەکان بارانێکی زۆرمان نەباراندووە؟
(١٥) تا بەهۆی ئەو بارانەوە جۆرەها دانەوێڵە و ڕووەک بڕوێنین.
(١٦) هەروەها چەندەها باخی چڕو پڕو لەیەک ئاڵاو بەدی نەهێناوە.
(١٧) (ئینجا دێتە سەر باسی هەواڵە گرنگ و سامناکەکە): بەڕاستی ڕۆژی جیاکردنەوە، کاتێکی دیاریکراوە (بۆ جیاکردنەوەی چاکان لە خراپان، ئیمانداران لە کافران، ستەمکاران لە ستەملێکراوان).
(١٨) ئەو ڕۆژەی کە فوو دەکرێت بە (صور)دا، جا پۆل پۆل و دەستە دەستە بەرەو مەیدانی لێپرسینەوە بێپەروا دێن.
(١٩) ئاسمان دەکرێتەوە و دەبێتە دەروازە و دەرگا (بۆ دابەزینی فریشتەکان).
(٢٠) کێوەکانیش هەڵدەکەنرێن و دەڕۆن بەئاسماندا وەک تراویلکە و سەرابێکی گەورە.
(٢١) بێگومان دۆزەخیش دەمێکە چاوەڕێی ئەو ڕۆژەیە و خۆی بۆ مەڵاسداوە.
(٢٢) دەبێتە مەنزڵگای خوانەناس و یاخیەکان...
(٢٣) هەزارەها ساڵی دوورو درێژ و نەبڕاوەی تێدا دەبەنەسەر...
(٢٤) لەناویدا ناچێژن فێنکاییەک، یا خواردنەوەیەکی بەتام...
(٢٥) جگە لەئاوی لەکوڵ و کێم و زووخاو.
(٢٦) کە ئەوەش پاداشتێکی لەبارو پڕاو پڕە (بۆ خوانەناسان).
(٢٧) چونکە ئەوانە کاتی خۆی بەتەمای ئەم ڕۆژە و لێپرسینەوەیە نەبوون، حەزیان لەباسی نەدەکرد.
(٢٨) بەڵکو زۆر بەتوندی دژایەتی ئایەتەکانی ئێمەیان دەکردو بەدرۆیان دەزانی ..
(٢٩) ئێمەش هەموو شتێکمان لەسەریان سەرژمێری کردووە و بەوردیی تۆمارمان کردووە.
(٣٠) (پاشان پێیان دەوترێت) دە بچێژن (ئەی خوانەناسان) لە سزاو ئازارو ئەشکەنجە بەولاوە، جا هەرگیز هیچی ترتان بۆ زیاد ناکەین.

إِنَّ لِلْمُتَّقِينَ مَفَازًا ﴿٣١﴾ حَدَآئِقَ وَأَعْنَٰبًا ﴿٣٢﴾ وَكَوَاعِبَ أَتْرَابًا ﴿٣٣﴾ وَكَأْسًا دِهَاقًا ﴿٣٤﴾ لَّا يَسْمَعُونَ فِيهَا لَغْوًا وَلَا كِذَّٰبًا ﴿٣٥﴾ جَزَآءً مِّن رَّبِّكَ عَطَآءً حِسَابًا ﴿٣٦﴾ رَّبِّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَمَا بَيْنَهُمَا ٱلرَّحْمَٰنِ لَا يَمْلِكُونَ مِنْهُ خِطَابًا ﴿٣٧﴾ يَوْمَ يَقُومُ ٱلرُّوحُ وَٱلْمَلَٰٓئِكَةُ صَفًّا لَّا يَتَكَلَّمُونَ إِلَّا مَنْ أَذِنَ لَهُ ٱلرَّحْمَٰنُ وَقَالَ صَوَابًا ﴿٣٨﴾ ذَٰلِكَ ٱلْيَوْمُ ٱلْحَقُّ فَمَن شَآءَ ٱتَّخَذَ إِلَىٰ رَبِّهِۦ مَـَٔابًا ﴿٣٩﴾ إِنَّآ أَنذَرْنَٰكُمْ عَذَابًا قَرِيبًا يَوْمَ يَنظُرُ ٱلْمَرْءُ مَا قَدَّمَتْ يَدَاهُ وَيَقُولُ ٱلْكَافِرُ يَٰلَيْتَنِى كُنتُ تُرَٰبًۢا ﴿٤٠﴾

سُورَةُ النَّازِعَاتِ

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

وَٱلنَّٰزِعَٰتِ غَرْقًا ﴿١﴾ وَٱلنَّٰشِطَٰتِ نَشْطًا ﴿٢﴾ وَٱلسَّٰبِحَٰتِ سَبْحًا ﴿٣﴾ فَٱلسَّٰبِقَٰتِ سَبْقًا ﴿٤﴾ فَٱلْمُدَبِّرَٰتِ أَمْرًا ﴿٥﴾ يَوْمَ تَرْجُفُ ٱلرَّاجِفَةُ ﴿٦﴾ تَتْبَعُهَا ٱلرَّادِفَةُ ﴿٧﴾ قُلُوبٌ يَوْمَئِذٍ وَاجِفَةٌ ﴿٨﴾ أَبْصَٰرُهَا خَٰشِعَةٌ ﴿٩﴾ يَقُولُونَ أَءِنَّا لَمَرْدُودُونَ فِى ٱلْحَافِرَةِ ﴿١٠﴾ أَءِذَا كُنَّا عِظَٰمًا نَّخِرَةً ﴿١١﴾ قَالُوا۟ تِلْكَ إِذًا كَرَّةٌ خَاسِرَةٌ ﴿١٢﴾ فَإِنَّمَا هِىَ زَجْرَةٌ وَٰحِدَةٌ ﴿١٣﴾ فَإِذَا هُم بِٱلسَّاهِرَةِ ﴿١٤﴾ هَلْ أَتَىٰكَ حَدِيثُ مُوسَىٰٓ ﴿١٥﴾

(٣١) بەڕاستی بۆ خواناس و پارێزکاران سەرفرازی و خۆشی و شادی و کامەرانی فراوان ئامادەیە.
(٣٢) چەندەها باخچەی جوان و جۆری ترێ.
(٣٣) (لەو جێگە و ڕێگە خۆشانەدا هاوسەرو هاودەمی) ئافرەتانی سینە جوان و (دیمەن جوان) هاوتەمەن ئامادەیە.
(٣٤) لەگەڵ کاسەی پڕ لە شەرابی تایبەتیدا.
(٣٥) لەو بەهەشتەدا هیچ جۆرە قسەیەکی پڕو پووچ و درۆو دەلەسەیەک نابیستن.
(٣٦) ئەمەش هەمووی پاداشتێکە لەلایەن پەروەردگارتەوە (ئەی ئیماندار)، بەخششێکە بە حسابێکی ورد دەبەخشرێت (بە بەختەوەران).
(٣٧) (لەلایەن) پەروەردگاری میهرەبانی ئاسمانەکان و زەوی و هەرچی لەنێوانیاندا هەیە، (ئەو ڕۆژە) کەس ناتوانێت لەبەردەم زاتی پەروەردگاردا بدوێت.
(٣٨) ڕۆژێک دێت جوبرەئیل و فریشتەکان بە ڕیز دەوەستن و ورتەیان لێ نایەت و هیچ قسە ناکەن، مەگەر ئەوەیان کە خوای میهرەبان مۆڵەتی بدات و قسەی جوان و بەجێ پێشکەش بکات.
(٣٩) ئەو ڕۆژە ڕۆژێکی حەق و ڕاستە و بەڕێوەیە.. جا ئەوەی دەیەوێت با بەرەو لای پەروەردگاری ڕێگە بگرێتە بەر.
(٤٠) بەڕاستی ئێمە ئێوەمان ئاگادار کردووە لەوەی کە سزایەکی نزیک بەڕێوەیە، ئەو ڕۆژە ڕۆژێکە کە ئادەمیزاد سەیری دەستپێشخەری خۆی دەکات، خوانەناسیش دەڵێت.. خۆزگە هەر خاک بوومایە (ئاوا زیندوو نەکرامایەتەوە و گیرم نەخواردایە).

سوورەتی (النازعـات)

بەناوی خوای بەخشندە و میهرەبان

(١) سوێند بەو فریشتانەی کە گیانی خەڵکی دەکێشن، یان بەو ئەستێرانەی کە لە قوڵایی ئاسماندا دەدرەوشێنەوە و دەسوڕێنەوە.
(٢) سوێند بەو فریشتانەی کە گیانی ئیمانداران دەکێشن بە چالاکی و بێ وچان دەسوڕێنەوە (کەس فەرامۆش ناکەن).
(٣) سوێند بەو فریشتانەی کە بە گورجی فەرمانی خوا جێبەجێ دەکەن، یان بەو ئەستێرانەی کە لە بۆشایی دا مەلە دەکەن و دەسوڕێنەوە.
(٤) هەروەها سوێند بەو فریشتانەی کە ڕۆحی ئیمانداران بەپەلە بە بەهەشت شاد دەکەن و ڕۆحی کافرانیش بەدۆزەخ دەگەیەنن، هەروەها پێشبڕکێ دەکەن و گورج و گۆڵ و ئامادەن بۆ ئەنجامدانی هەر کارێک پێیان دەسپێردرێت.
(٥) سوێند بەو فریشتانەی (کە بەویستی خوا) کارو فەرمان جێبەجێ دەکەن بە ڕێک و پێکی.
(٦) (سوێند بەوانە هەمووی) لە ڕۆژێکدا (فوو دەکرێت بە صوردا، دەستبەجێ) زەوی بەتوندی تەکان دەدات و دەکەوێتە لەرزە و ژێرەو ژوور دەبێت.
(٧) دوایی دووبارە فووی پیادەکرێتەوە (مردووان زیندوو دەکرێنەوە و جیهانی هەمیشەیی بەرپا دەبێت).
(٨) لەو ڕۆژەدا دڵانێک بەخێرایی لێ دەدەن، زۆر دەترسن و زۆر پەرێشانن.
(٩) خاوەنی ئەو دڵانە لە ڕیسوایی و خەجاڵەتی و شەرمەزاریدا چاویان شۆڕە و ڕوویان نایەت سەر هەڵبڕن.
(١٠) (ئەمانە کاتی خۆی) دەیانوت: باشە ئێمە لەم گۆڕانە دەردێین و زیندوودەکرێینەوە؟...
(١١) کاتێک بووینە ئێسکی ڕزیوو پرتوکاو؟!
(١٢) (بە گاڵتە پێکردن و بێ بڕواییەوە) دەیانوت: ئەگەر وابێت، گەڕانەوەیەکی زۆر زیانبەخشە!!
(١٣) (با خوانەناسان چاک بزانن) بەڕاستی تەنها گەڕانەوەیە یەک تێخوڕینە.
(١٤) جا دەستبەجێ هەر هەموو ئەو خەڵکە بێداردەبنەوە و زیندوودەبنەوە و لە گۆڕەپانی لێپرسینەوەدا ئامادە دەبن.
(١٥) (ئینجا دێتە سەر باسی سەرگوزەشتەی حەزرەتی موسا دڵخۆشی پێغەمبەر ﷺ دەداتەوە و دەفەرموێت): ئایا بەسەرهاتی موسات پێگەیشتووە؟!

إِذْ نَادَىٰهُ رَبُّهُۥ بِٱلْوَادِ ٱلْمُقَدَّسِ طُوًى (١٦) ٱذْهَبْ إِلَىٰ فِرْعَوْنَ إِنَّهُۥ طَغَىٰ (١٧) فَقُلْ هَل لَّكَ إِلَىٰٓ أَن تَزَكَّىٰ (١٨) وَأَهْدِيَكَ إِلَىٰ رَبِّكَ فَتَخْشَىٰ (١٩) فَأَرَىٰهُ ٱلْـَٔايَةَ ٱلْكُبْرَىٰ (٢٠) فَكَذَّبَ وَعَصَىٰ (٢١) ثُمَّ أَدْبَرَ يَسْعَىٰ (٢٢) فَحَشَرَ فَنَادَىٰ (٢٣) فَقَالَ أَنَا۠ رَبُّكُمُ ٱلْأَعْلَىٰ (٢٤) فَأَخَذَهُ ٱللَّهُ نَكَالَ ٱلْـَٔاخِرَةِ وَٱلْأُولَىٰٓ (٢٥) إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَعِبْرَةً لِّمَن يَخْشَىٰٓ (٢٦) ءَأَنتُمْ أَشَدُّ خَلْقًا أَمِ ٱلسَّمَآءُ ۚ بَنَىٰهَا (٢٧) رَفَعَ سَمْكَهَا فَسَوَّىٰهَا (٢٨) وَأَغْطَشَ لَيْلَهَا وَأَخْرَجَ ضُحَىٰهَا (٢٩) وَٱلْأَرْضَ بَعْدَ ذَٰلِكَ دَحَىٰهَآ (٣٠) أَخْرَجَ مِنْهَا مَآءَهَا وَمَرْعَىٰهَا (٣١) وَٱلْجِبَالَ أَرْسَىٰهَا (٣٢) مَتَٰعًا لَّكُمْ وَلِأَنْعَٰمِكُمْ (٣٣) فَإِذَا جَآءَتِ ٱلطَّآمَّةُ ٱلْكُبْرَىٰ (٣٤) يَوْمَ يَتَذَكَّرُ ٱلْإِنسَٰنُ مَا سَعَىٰ (٣٥) وَبُرِّزَتِ ٱلْجَحِيمُ لِمَن يَرَىٰ (٣٦) فَأَمَّا مَن طَغَىٰ (٣٧) وَءَاثَرَ ٱلْحَيَوٰةَ ٱلدُّنْيَا (٣٨) فَإِنَّ ٱلْجَحِيمَ هِىَ ٱلْمَأْوَىٰ (٣٩) وَأَمَّا مَنْ خَافَ مَقَامَ رَبِّهِۦ وَنَهَى ٱلنَّفْسَ عَنِ ٱلْهَوَىٰ (٤٠) فَإِنَّ ٱلْجَنَّةَ هِىَ ٱلْمَأْوَىٰ (٤١) يَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلسَّاعَةِ أَيَّانَ مُرْسَىٰهَا (٤٢) فِيمَ أَنتَ مِن ذِكْرَىٰهَآ (٤٣) إِلَىٰ رَبِّكَ مُنتَهَىٰهَآ (٤٤) إِنَّمَآ أَنتَ مُنذِرُ مَن يَخْشَىٰهَا (٤٥) كَأَنَّهُمْ يَوْمَ يَرَوْنَهَا لَمْ يَلْبَثُوٓا۟ إِلَّا عَشِيَّةً أَوْ ضُحَىٰهَا (٤٦)

سُورَةُ عَبَسَ

(١٦) كاتێك پەروەردگارى لە دۆڵى (طـوى) دا بانگى كرد و گفتوگۆى لەگەڵدا كرد و فەرمانى پێدا:
(١٧) بچۆ بۆ لاى فيرعەون (چونكە) بەڕاستى لە سنوور دەرچووە و ستەمى بێ ئەندازەيە.
(١٨) پێى بڵێ: باشە ئەوە ناكرێت دڵ و دەروون و كردارو ڕەفتارت پاك و جوان و پوختە بێت!
(١٩) تارێنمووێت بكەم بۆ ناسينى پەروەردگارت، تا ترسى (سزاى) ئەو زاتەت هەبێت و ستەم نەكەيت).
(٢٠) (ديارە فيرعەون داواى بەڵگەى كردوە) ئەويش موعجيزە گەورەكەى نيشانداوە(كە دار عاساكەيە).
(٢١) (بەڵام) بەدرۆى زانى و ياخى بوو.
(٢٢) لەوەودوا پشتى هەڵكردو كەوتە هەوڵ و تێكۆشان (بۆ بەرهەڵستى موسا و دژايەتى ئيمان).
(٢٣) خەڵكى كۆكردەوە و بەدەنگى بەرز وتى:
(٢٤) من پەروەردگارى هەرە بەرزو بڵندى ئێوەم!!
(٢٥) ئەوسا خوا دووچارى سزاى قيامەت و دنياى كرد.
(٢٦) بەڕاستى ئا لەو بەسەرهاتەدا پەندو ئامۆژگارى هەيە بۆ هەركەسێك لە خوا بترسێت. (ئينجا دێتە سەر باسى هەندێك لە دروستكراوانى كە بەڵگەن لەسەر دەسەڵات و گەورەيى ئەو زاتە).
(٢٧) باشە ئاخر زيندووكردنەوەى ئێوە سەخترو گرانترە، يان بەديهێنانى ئەم ئاسمانە، كە هەر خۆى بەرپاى كردووە (كە پڕە لە ئەستێرەوهەسارەى گەورەى هەمەجۆر).
(٢٨) بەبەرزيەوە ڕاى‌گرتووە و بەوپەڕى ڕێكو پێكى بەديهێناوە (بە ڕاسەرتانەوە).
(٢٩) شەوگارەكەى تاريك كردووە، كاتى چێشتەنگاويش رووناك خۆرى دەرخستووە.
(٣٠) دواتر زەويشى بەشێوەيەكى هێلكەيى بەديهێناوە.
(٣١) ئاوى لێ‌دەرهێناوە و لەوەڕگاى بۆ ماڵات فەراهەم هێناوە.
(٣٢) كێوەكانيشى بە تۆكمەيى دامەزراندووە.
(٣٣) (هەموو ئەمانەمان دروست كردووە) تا ببێتە هۆى ئەوەى كە خۆتان و ماڵاتەكانيشتان سوودى لێ وەربگرن.
(٣٤) جا كاتێك بەڵا گەورەكە پێشهات، كە تەنگانە سامناكەكە ڕوويدا، (مەبەست ڕۆژى قيامەتە).
(٣٥) ئەو ڕۆژە ئادەميزاد دێتەوە يادى كە چى كردووە و چى ئەنجامداوە.
(٣٦) دۆزەخ نيشان دەدرێت و دەردەخرێت بۆ هەركەسێك كە ببينێت...
(٣٧) جا ئەوەى خوانەناس و ياخى و لەسنوور دەرچوو بێت...
(٣٨) ژيانى دنياى زياتر لە قيامەت مەبەست بووبێت...
(٣٩) ئەوە بێگومان ئەو دۆزەخە جێگەى مانەوە و حەوانەوەيەتى!!
(٤٠) بەڵام ئەوەى لە پايەو شكۆى پەروەردگارى ترسابێت و حسابى بۆ كردبێت و جڵەوى نەفسى گرتبێتەوە لە هەموو هەواو هەوەس و ئارەزوويەكى نادروست ...
(٤١) بێگومان هەر بەهەشت جێگەى مانەوە و حەوانەوە و گوزەرانيەتى.
(٤٢) پرسيارت لێدەكەن (ئەى پێغەمبەر ﷺ) دەربارەى قيامەت، كە كەى؟ چ كاتێك بەرپا دەبێت؟
(٤٣) جا تۆ لەكوێ دەزانيت كەى بەرپا دەبێت!! تۆ لە كوێ و ئەو باسە لەكوێ؟
(٤٤) بێگومان كۆتايى دنياو بەرپابوونى قيامەت، هەر پەروەردگارت دەيزانێت.
(٤٥) بێگومان ئەركى تۆ تەنها بێداركەرەوەى ئەو كەسانەيە كە لەو ساتە دەترسن.
(٤٦) ئەو ڕۆژەى كە قيامەت بەرپا دەبێت، بێ باوەڕان وادەزانن كە تەنها سەر لەئێوارەيەك يان سەر لەبەيانيەك درێژەى ژيانى دنيايان بووە.

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

عَبَسَ وَتَوَلَّىٰٓ ﴿١﴾ أَن جَآءَهُ ٱلْأَعْمَىٰ ﴿٢﴾ وَمَا يُدْرِيكَ لَعَلَّهُۥ يَزَّكَّىٰٓ ﴿٣﴾ أَوْ يَذَّكَّرُ فَتَنفَعَهُ ٱلذِّكْرَىٰٓ ﴿٤﴾ أَمَّا مَنِ ٱسْتَغْنَىٰ ﴿٥﴾ فَأَنتَ لَهُۥ تَصَدَّىٰ ﴿٦﴾ وَمَا عَلَيْكَ أَلَّا يَزَّكَّىٰ ﴿٧﴾ وَأَمَّا مَن جَآءَكَ يَسْعَىٰ ﴿٨﴾ وَهُوَ يَخْشَىٰ ﴿٩﴾ فَأَنتَ عَنْهُ تَلَهَّىٰ ﴿١٠﴾ كَلَّآ إِنَّهَا تَذْكِرَةٌ ﴿١١﴾ فَمَن شَآءَ ذَكَرَهُۥ ﴿١٢﴾ فِى صُحُفٍ مُّكَرَّمَةٍ ﴿١٣﴾ مَّرْفُوعَةٍ مُّطَهَّرَةٍۭ ﴿١٤﴾ بِأَيْدِى سَفَرَةٍ ﴿١٥﴾ كِرَامٍۭ بَرَرَةٍ ﴿١٦﴾ قُتِلَ ٱلْإِنسَٰنُ مَآ أَكْفَرَهُۥ ﴿١٧﴾ مِنْ أَىِّ شَىْءٍ خَلَقَهُۥ ﴿١٨﴾ مِن نُّطْفَةٍ خَلَقَهُۥ فَقَدَّرَهُۥ ﴿١٩﴾ ثُمَّ ٱلسَّبِيلَ يَسَّرَهُۥ ﴿٢٠﴾ ثُمَّ أَمَاتَهُۥ فَأَقْبَرَهُۥ ﴿٢١﴾ ثُمَّ إِذَا شَآءَ أَنشَرَهُۥ ﴿٢٢﴾ كَلَّا لَمَّا يَقْضِ مَآ أَمَرَهُۥ ﴿٢٣﴾ فَلْيَنظُرِ ٱلْإِنسَٰنُ إِلَىٰ طَعَامِهِۦٓ ﴿٢٤﴾ أَنَّا صَبَبْنَا ٱلْمَآءَ صَبًّا ﴿٢٥﴾ ثُمَّ شَقَقْنَا ٱلْأَرْضَ شَقًّا ﴿٢٦﴾ فَأَنۢبَتْنَا فِيهَا حَبًّا ﴿٢٧﴾ وَعِنَبًا وَقَضْبًا ﴿٢٨﴾ وَزَيْتُونًا وَنَخْلًا ﴿٢٩﴾ وَحَدَآئِقَ غُلْبًا ﴿٣٠﴾ وَفَٰكِهَةً وَأَبًّا ﴿٣١﴾ مَّتَٰعًا لَّكُمْ وَلِأَنْعَٰمِكُمْ ﴿٣٢﴾ فَإِذَا جَآءَتِ ٱلصَّآخَّةُ ﴿٣٣﴾ يَوْمَ يَفِرُّ ٱلْمَرْءُ مِنْ أَخِيهِ ﴿٣٤﴾ وَأُمِّهِۦ وَأَبِيهِ ﴿٣٥﴾ وَصَٰحِبَتِهِۦ وَبَنِيهِ ﴿٣٦﴾ لِكُلِّ ٱمْرِئٍ مِّنْهُمْ يَوْمَئِذٍ شَأْنٌ يُغْنِيهِ ﴿٣٧﴾ وُجُوهٌ يَوْمَئِذٍ مُّسْفِرَةٌ ﴿٣٨﴾ ضَاحِكَةٌ مُّسْتَبْشِرَةٌ ﴿٣٩﴾ وَوُجُوهٌ يَوْمَئِذٍ عَلَيْهَا غَبَرَةٌ ﴿٤٠﴾ تَرْهَقُهَا قَتَرَةٌ ﴿٤١﴾ أُولَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْكَفَرَةُ ٱلْفَجَرَةُ ﴿٤٢﴾

## سوورەتی (عبس)

### بەناوی خوای بەخشندە و میهرەبان

(١) رووی گرژکردو رووی وەرگێرا (مەبەست پێغەمبەرە ﷺ کاتێک (عبدالله ی کوڕی ام مکتوم)کە ئیماندارێکی نابینابوو هات بۆ خزمەتی، ئەویش هەندێک لە سەرانی قورەیشی کۆ کردبۆوە بەئومێدی هیدایەتیان، عبدلله وتی: ئەی پێغەمبەری خوا، خوا چی فێرکردوویت منیش فێر بکە، پێغەمبەر ﷺ پێی ناخۆش بوو کە قسەکانی پێ دەبڕێت، لەبەرئەوە رووی گرژکرد و رووی وەرگێرا. بۆیە سەرەتای ئەم سوورەتە دابەزی کە گلەییە لە پێغەمبەر ﷺ).

(٢) لەبەرئەوەی نابیناکە هات بۆ لای.

(٣) جا تۆ چوزانیت بەڵکو ئەو هاتبێت تا دڵ و دەروونی خاوێن بکاتەوە.

(٤) یاخود ئامۆژگاری وەربگرێت، تا ئامۆژگاریەکە سوودی پێبگەیەنێت.

(٥) بەلام ئەوەی کە خۆی بێ‌نیاز نیشان دەدات و نایەوێت رێنورمایی وەربگرێت.

(٦) تۆ لەگەل ئەودا کۆدەبیتەوە و گرنگی بەو دەدەیت و روو لەو دەکەیت.

(٧) جا تۆ هیچ گوناهبار نابیت کە ئەو ئیمانی نەوێت و پاک و پوختەکردنی دەروونی نەوێت.

(٨) بەلام ئەوەی کە خۆی هاتوەتە لات و کۆشش دەکات و مەبەستێتی کە شارەزای بەرنامەی خوا ببێت...

(٩) لەکاتێکدا ئەو لە خوا دەترسێت.

(١٠) ئەوە تۆ گوێ بەو نادەیت و خۆتی لێ بێ ئاگا دەکەیت.

(١١) نەخێر وامەکەو وامەبە، چونکە بەراستی ئەم ئایەتانە، ئەم سورەتە، یادخستنەوە و ئامۆژگاریە.

(١٢) جا کەسێک بیەوێت رێنموویی وەرگرێت، ئەوە یادی دەکات.

(١٣) (ئەو قورئانە) لە چەندین لاپەرەی بەرێزو پیرۆزدا هەلگیراوە و لە(لوح المحفوظ) وەرگیراوە.

(١٤) کە بەرزو بلندو پاک و خاوێنن.

(١٥) بەدەستی فریشتە نووسەرەکان.

(١٦) کە بەرێزو خواناس و ملکەچ و فەرمانبەردارن.

(١٧) ئەی ئادەمیزاد، بەکوشت بچیت، چەندە کافرە، سپلەیە، چەندە خوانەناس و یاخیە، یاخود بەکوشت چێت ئادەمیزاد چی وای لێکردووە کە کافر بێت؟! چ پاساوێکی هەیە بۆ خوانەناسی و یاخی‌بوون.

(١٨) (بۆ بیرناکاتەوە) خوا لەچی دروستی کردووە؟!

(١٩) لە نوتفەیەک (لە خالێکی زۆر بچووک کە بە چاو نابینرێت) دروستی کردووە و هەموو ئەندامانی دەر و ناوی پێ‌بەخشیوە و ئەندازەگیری وردی لە دروستکردنیدا ئەنجام داوە، (کات و شوێنی لەدایکبوون و مردنی بۆ دیاری کردووە).

(٢٠) لەوەودوا ژیانی بۆ ئاسان کردووە و سەرپشکی کردووە لە پەیڕەوی‌کردنی رێگەی چاکە یان خراپە، ئیمان یان کوفر، (دوای ئەوەی کە دەست نیشانی هەردووکیانی بۆ کردووە و سەرەنجامی روون کردۆتەوە).(٢١) لەوەودوا دەیمرێنێت و دەیخاتە ناو گۆرەوە.

(٢٢) پاشان کاتێک بیەوێت زیندووی دەکاتەوە.(٢٣) بەراستی، ئەوەی کە خوا فەرمانی پێداوە هێشتا ئادەمیزاد بەجێی نەهێناوە.

(٢٤) دەبا ئادەمیزاد سەیری خواردنەکەی بکات و سەرنجی بدات و بیری لێ‌بکاتەوە.

(٢٥) بێگومان ئێمە ئاومان بۆ داباراندوەتە خوارەوە، چۆن دابارینێت.

(٢٦) لەوەودوا زەویمان بۆ لەت لەت بە چەکەرەی ئاسکی رووەک.　(٢٧)ئینجا دانەوێڵەمان تیادا رواند.

(٢٨) هەروەها ترێ و سەوزەمان.(٢٩) هەروەها زەیتوون و دارخورمایش.

(٣٠) باخچەی دەورەدراو بە دارخورما یان درەختی تر، یاخود باخی چڕو پڕ.

(٣١) جۆرەها میوە، هاورێ لەگەل هەموو ئەو گژو گیایانەی کە خواکردە و ماڵات دەیخوات لە لەوەڕگاکاندا.

(٣٢) (هەموو ئەمانە ئامادەمان کردووە) تا خۆتان و ماڵاتەکانتان سوودی لێ وەربگرن.

(٣٣) جا کاتێک قیامەت بەرپا بوو بەهۆی دەنگێکی بەهێزی گوێ کپ کەرەوە.

(٣٤) ئەو رۆژە (هێندە سامناکە) برا لەدەست براکەی هەلدێت و رادەکات و خۆی لێ دەشارێتەوە.

(٣٥) هەروەها لەدەست دایک و باوکی...　(٣٦) لەدەست هاوسەرو کورەکانی...

(٣٧) لەو رۆژەدا هەرکەسێک لەوانە ئەوەندە سەرگەرمی کێشەی خۆیەتی، ناتوانێت فریای کەسی تر بکەوێت.

(٣٨) لەو رۆژەدا رووخسارانێک گەش و جوان و روون و شادن.　(٣٩) دەم بەپێکەنینن، مژدە و شادییان لێ دەدرەوشێتەوە.

(٤٠) لەو رۆژەدا رووخسارانێکیش هەن کە گرژو تاڵ و ترش و تۆزاوی و پەست و غەمگینن.

(٤١) دێزی و رەشی و تاریکی دایپۆشیوون.　(٤٢) ئا ئەوانە بێ‌باوەڕو خوانەناس و تاوانبارو گوناهکارەکانن.



سوورەتى (التكــويـر)

بەناوى خواى بەخشندە و میهرەبان

(١) کاتێک خۆر دەپێچرێتەوە و رووناکی نامێنێت.
(٢) کاتێکیش ئەستێرەکان (لە خولگــەی خۆیــان) دەترازێن و دەدەن بەیەکدا.
(٣) کاتێک کێوەکان لە شوێنی خۆیان هەڵدەکەنرێن و بەملاولادا دەبرێن.
(٤) کاتێک حوشترانی ئاوس کە تەمەنی بــارداریيان دە مانگــە گوێيان پێنــادرێت (بێگومــان ئــەو وشترانە لای عەرەب زۆر نازدارن).
(٥) کاتێک گیانلەبەرانی کێوی و وەحشی و درندە بــە دەوری یــەکدا کۆدەکرێنــەوە (ئــەوانیش درندايــەتی خۆيانیان لەبیر دەچێتەوە لە سامناکی ئەو رۆژە).
(٦) کــاتێک دەرياکــان گــڕ دەدرێــن (ديــارە کــە تەقینەوەی ئەتۆمی روودەدات و ئاوی دەرياکان دەبنەوە بە هايدرۆجين و ئۆکسجين).
(٧) کاتێک گیانی هەر کەس دەگەڕێتەوە بۆ لاشــەی و جووت دەبێتەوە لەگەڵیدا.
(٨) کاتێک کچی زیندە بەچاڵکراوپرسیاری لێدەکرێت.
(٩) بە چ گوناهێک، بە چ تۆمەتێک کوژرا؟!
(١٠) کاتێک نامەی کردەوەکان والا دەکرێت.
(١١) کاتێک ئاسمان لادەبرێن و دادەماڵرێن.
(١٢) کاتێک دۆزەخ دادەگیرسێت و تاودەدرێت.
(١٣) کــاتێک بەهەشــت نزیــک دەخرێتــەوە (لــە خواناسان).
(١٤) ئیتر ئەو کاتــە هەرکــەس دەزانێت چی ئامــادە کردووە و چ توێشوويەکی پێيە.
(١٥) سوێند بــەو ئەستێرانەی کە پەنهان دەبــن و ون دەبــن لــەچاو، يــاخود بــەهۆی ســوڕانەوەی زەوی و خۆيانەوە (بەهۆی هەڵهاتنی خۆرەوە) ون دەبن.
(١٦) بەو هەسارانەی کە پەنا دەگرن و ديار نامێنن.
(١٧) بەو شەوەی کە دادێت و تاريکايی‌يەکەی رووماں تێدەکات.
(١٨) بە بەرەبەيان کە پشووی تیَ‌دێت، وەکو زیندەوەرێک ئاهی تێ‌دێتەوە و دەست دەکات بە هەناســەدان و ژيان و رووناکی‌يەکەی دەردەکەوێت.
(١٩) (سوێند بەوانە هەمووی) بەڕاستی، بێ‌دوودڵی ئەم قورئانە لەزاری نێردراوێکی بەڕێزەوەیە (کە جوبرەئیلە).
(٢٠) خاوەنی هێزو دەسەڵاتە و لای خاوەنی عەرش، فريشتەيەکی پايەدارە.
(٢١) فەرمانڕەوايە لەوێ، هەروەها ئەمین و دڵسۆزە لە کارەکانیدا.
(٢٢) دڵنيابن کە هاوڕێکەتان (محمد ﷺ) شێت نیە و (لەکەماڵی ژيریدايە).
(٢٣) بێگومان محمد ﷺ جوبرەئیلی بینی بە ئاشکرا لە ئاسۆی ئومايانداا.
(٢٤) هەرچی پێ دەگات، لە جیهانی نهێنی و شاراوەکانەوە، لێتــان ئاشــارێتەوە و راستیتان پــێ رادەگەيــەنێت چونکــە هــەرگيز لــە گەياندنی پەيامەکەيدا رژدو رەزيل نیە.
(٢٥) ئەم قورئانە گوفتاری شەيتانی نەفرين لێکراو نی‌يە. (٢٦) ئيتر بۆ کوێ دەچن؟ روو دەکەنە کوێ؟ روو دەکەنە کێ؟!
(٢٧) ئەم قورئانە تەنها يادخەرەوەيە بۆ سەرجەم دانيشتووانی زەوی (بۆ پەری و ئادەمیزاد لە هەموو سەردەمەکاندا).
(٢٨) بۆ ئەوانەتان کە دەيانەوێت رێبازی راست و دروست بگرنەبەر.
(٢٩) ويستی ئێوەش نايەتە دێتە دی مەگەر کاتێک خوای پەروەردگاری جيهانيان بيەوێت، (هەرکەس ويستی خــێری هــەبێت خوای گەورە سەربەرستی لێ زەوت ناکات، لەگەڵ ئەوەشدا هەر ئەوە پێش دێت کــە ويستی خــوای لەســەرە و توانــای تێگــەيشتنمان لــە نهێنی و شاراوەکان زۆر سنووردارە).



بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

إِذَا السَّمَاءُ انفَطَرَتْ ﴿١﴾ وَإِذَا الْكَوَاكِبُ انتَثَرَتْ ﴿٢﴾ وَإِذَا الْبِحَارُ فُجِّرَتْ ﴿٣﴾ وَإِذَا الْقُبُورُ بُعْثِرَتْ ﴿٤﴾ عَلِمَتْ نَفْسٌ مَّا قَدَّمَتْ وَأَخَّرَتْ ﴿٥﴾ يَا أَيُّهَا الْإِنسَانُ مَا غَرَّكَ بِرَبِّكَ الْكَرِيمِ ﴿٦﴾ الَّذِي خَلَقَكَ فَسَوَّاكَ فَعَدَلَكَ ﴿٧﴾ فِي أَيِّ صُورَةٍ مَّا شَاءَ رَكَّبَكَ ﴿٨﴾ كَلَّا بَلْ تُكَذِّبُونَ بِالدِّينِ ﴿٩﴾ وَإِنَّ عَلَيْكُمْ لَحَافِظِينَ ﴿١٠﴾ كِرَامًا كَاتِبِينَ ﴿١١﴾ يَعْلَمُونَ مَا تَفْعَلُونَ ﴿١٢﴾ إِنَّ الْأَبْرَارَ لَفِي نَعِيمٍ ﴿١٣﴾ وَإِنَّ الْفُجَّارَ لَفِي جَحِيمٍ ﴿١٤﴾ يَصْلَوْنَهَا يَوْمَ الدِّينِ ﴿١٥﴾ وَمَا هُمْ عَنْهَا بِغَائِبِينَ ﴿١٦﴾ وَمَا أَدْرَاكَ مَا يَوْمُ الدِّينِ ﴿١٧﴾ ثُمَّ مَا أَدْرَاكَ مَا يَوْمُ الدِّينِ ﴿١٨﴾ يَوْمَ لَا تَمْلِكُ نَفْسٌ لِّنَفْسٍ شَيْئًا وَالْأَمْرُ يَوْمَئِذٍ لِّلَّهِ ﴿١٩﴾

سُورَةُ المُطَفِّفِين

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

وَيْلٌ لِّلْمُطَفِّفِينَ ﴿١﴾ الَّذِينَ إِذَا اكْتَالُوا عَلَى النَّاسِ يَسْتَوْفُونَ ﴿٢﴾ وَإِذَا كَالُوهُمْ أَو وَّزَنُوهُمْ يُخْسِرُونَ ﴿٣﴾ أَلَا يَظُنُّ أُولَٰئِكَ أَنَّهُم مَّبْعُوثُونَ ﴿٤﴾ لِيَوْمٍ عَظِيمٍ ﴿٥﴾ يَوْمَ يَقُومُ النَّاسُ لِرَبِّ الْعَالَمِينَ ﴿٦﴾

## سورەتی (الإنفطار)

بەناوی خوای بەخشندە و میهرەبان

(١) کاتێک ئاسمان لەت لەت و پارچە پارچە دەبێت.
(٢) کاتێک ئەستێرە و هەسارەکان پەرش و بڵاو دەبنەوە و ورد و خاش دەبن.
(٣) کاتێک دەریاکان دەتەقێنرێنەوە.
(٤) کاتێک کە گۆڕەکان ژێرە و ژوور دەکرێن (مردووەکانی ناویان دەهێنرێنە دەرەوە و زیندوو دەکرێنەوە).
(٥) ئەوسا هەرکەس دەزانێت چی پێشخستووە و چی دواخستووە، چی دەستپێشکەری کردووە و چیشی هێشتۆتەوە (لە کارو کردەوەی چاک، یان خراپ کە خەڵکی دوای خۆی چاویان لێ کردووە).
(٦) ئەی ئینسان!! تۆ چی وای لێکردویت کە سەرکەش بیت بەرامبەر پەروەردگاری میهرەبان و بەرێزت؟! چی وای لێکردویت کە وەکو پێویست قەدری نەزانیت؟ (نافەرمان و یاخی بیت؟).
(٧) (بەمەرجێک) ئەو پەروەردگارە تۆی دروست کردووە، بە ڕێکوپێکترین شێوە، بەجوانترین شێواز (ئەندامەکان هەموو لەشوێنی تایبەتی خۆیاندا دانراون کە بتوانن کارو فرمانی خۆیان بەچاکی ئەنجام بدەن و ئەو ئەندامانەش کە جووتن قەبارە و درێژی و شێوەیان چوونیەکە، جگە لەوەی کە یارمەتی و تەباییەکی تەواو هەیە لەنێوانیاندا و هەمووان هاوکارن).
(٨) لەهەر شێوە و شێوازێکدا کە ویستوویەتی تۆی ڕێکخستووە و ئەندامەکانتی بەیەکەوە لکاندووە.
(٩) واز بهێنن لە بێ ئاگایی، (نەدەبوو وابیت بەرامبەر ئەو پەروەردگارە جوانکارەت، سەرەڕای ئەو هەموو روون کردنەوانە) بەڵکو بڕوا بەرۆژی پاداشت ناکەن!!
(١٠) بێگومان ئێوە چاودێرتان لەسەر دانراوە.
(١١) لە فریشتە بەرێزە تۆمارکارەکان.
(١٢) کە ئاگاو زانان بەهەموو ئەو کردەوە و ڕەفتارانەی کە ئەنجامی دەدەن.
(١٣) (سەرئەنجام) بەڕاستی چاکان، خواناسان لەناو نازو نیعمەتدا ژیانێ پڕ لە شادی و خۆشی دەبەنەسەر.
(١٤) بێگومان تاوانبارو تاوانکارەکانیش لەناو دۆزەخدا ژیانی پڕ لە ئێش و ئازار دەبەنەسەر.
(١٥) کە لە رۆژی قیامەتدا دەخرێنە ناوی و دووچاری دەبن.
(١٦) لەناویدا ئەوان بەهیچ شێوەیەک رزگاریان نابێت و ناتوانن لێی دووربکەونەوە و خۆیانی لێ بشارنەوە.
(١٧) جا تۆ ئەی ئینسان چووزانیت رۆژی قیامەت چیە و چۆنە؟!
(١٨) پاشان تۆ چووزانیت ئەو رۆژە چۆن رۆژێکە، (چەند سەختە، چەند سامناکە، چەندە پڕ لە مەینەتە).
(١٩) ئەو رۆژە کەس فریای کەس ناکەوێت، کەس هیچ شتێکی لە دەست نایەت بۆکەسانی تر، ئەو رۆژە هەموو شتێک بەدەست خوایە، فەرمان تەنها فەرمانی پەروەردگاری دادپەروەرە.

## سورەتی (المطففین)

بەناوی خوای بەخشندە و میهرەبان

(١) هاوارو ئاهو ناڵە بۆ تەرازووبازەکان، بۆ ئەوانەی کە لەکێشان و پێواندا لەکڕین و فرۆشتندا تەرازوو بازی و فێڵ دەکەن (یان لە هەڵسەنگاندنی خەڵکیدا راست ناڵێن). (٢) ئەوانەی کاتێک شت لە خەڵکی دەکڕن بە تەواوی، بە زیادەوە لێیان وەردەگرن.
(٣) بەڵام کاتێک شتیان بۆ دەپێون یان دەکێشن لێی دەدزنەوە و کەمیان دەدەنێ و فێڵیان لێدەکەن.
(٤) ئایا ئەوانە گومان نابەن کە بەڕاستی زیندوو دەکرێنەوە (تا سەرئەنجامی خیانەت و فێڵیان وەربگرن).
(٥) بۆ رۆژێکی زۆر سامناک و ترسناک و گەورە.
(٦) ئەو رۆژەی کە هەموو خەڵکی بەپێوە دەوەستن لەبەردەم دەسەڵاتی پەروەردگاری جیهانیاندا.

كَلَّآ إِنَّ كِتَٰبَ ٱلْفُجَّارِ لَفِى سِجِّينٍ ﴿٧﴾ وَمَآ أَدْرَىٰكَ مَا سِجِّينٌ ﴿٨﴾ كِتَٰبٌ
مَّرْقُومٌ ﴿٩﴾ وَيْلٌ يَوْمَئِذٍ لِّلْمُكَذِّبِينَ ﴿١٠﴾ ٱلَّذِينَ يُكَذِّبُونَ بِيَوْمِ ٱلدِّينِ ﴿١١﴾
وَمَا يُكَذِّبُ بِهِۦٓ إِلَّا كُلُّ مُعْتَدٍ أَثِيمٍ ﴿١٢﴾ إِذَا تُتْلَىٰ عَلَيْهِ ءَايَٰتُنَا قَالَ أَسَٰطِيرُ
ٱلْأَوَّلِينَ ﴿١٣﴾ كَلَّا ۖ بَلْ ۜ رَانَ عَلَىٰ قُلُوبِهِم مَّا كَانُوا۟ يَكْسِبُونَ ﴿١٤﴾ كَلَّآ إِنَّهُمْ
عَن رَّبِّهِمْ يَوْمَئِذٍ لَّمَحْجُوبُونَ ﴿١٥﴾ ثُمَّ إِنَّهُمْ لَصَالُوا۟ ٱلْجَحِيمِ ﴿١٦﴾ ثُمَّ يُقَالُ
هَٰذَا ٱلَّذِى كُنتُم بِهِۦ تُكَذِّبُونَ ﴿١٧﴾ كَلَّآ إِنَّ كِتَٰبَ ٱلْأَبْرَارِ لَفِى عِلِّيِّينَ
﴿١٨﴾ وَمَآ أَدْرَىٰكَ مَا عِلِّيُّونَ ﴿١٩﴾ كِتَٰبٌ مَّرْقُومٌ ﴿٢٠﴾ يَشْهَدُهُ ٱلْمُقَرَّبُونَ
﴿٢١﴾ إِنَّ ٱلْأَبْرَارَ لَفِى نَعِيمٍ ﴿٢٢﴾ عَلَى ٱلْأَرَآئِكِ يَنظُرُونَ ﴿٢٣﴾ تَعْرِفُ فِى
وُجُوهِهِمْ نَضْرَةَ ٱلنَّعِيمِ ﴿٢٤﴾ يُسْقَوْنَ مِن رَّحِيقٍ مَّخْتُومٍ ﴿٢٥﴾
خِتَٰمُهُۥ مِسْكٌ ۚ وَفِى ذَٰلِكَ فَلْيَتَنَافَسِ ٱلْمُتَنَٰفِسُونَ ﴿٢٦﴾ وَمِزَاجُهُۥ
مِن تَسْنِيمٍ ﴿٢٧﴾ عَيْنًا يَشْرَبُ بِهَا ٱلْمُقَرَّبُونَ ﴿٢٨﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ
أَجْرَمُوا۟ كَانُوا۟ مِنَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ يَضْحَكُونَ ﴿٢٩﴾ وَإِذَا مَرُّوا۟ بِهِمْ
يَتَغَامَزُونَ ﴿٣٠﴾ وَإِذَا ٱنقَلَبُوٓا۟ إِلَىٰٓ أَهْلِهِمُ ٱنقَلَبُوا۟ فَكِهِينَ ﴿٣١﴾
وَإِذَا رَأَوْهُمْ قَالُوٓا۟ إِنَّ هَٰٓؤُلَآءِ لَضَآلُّونَ ﴿٣٢﴾ وَمَآ أُرْسِلُوا۟ عَلَيْهِمْ
حَٰفِظِينَ ﴿٣٣﴾ فَٱلْيَوْمَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ مِنَ ٱلْكُفَّارِ يَضْحَكُونَ ﴿٣٤﴾

(٧) واز بهێنن له تەرازووبازی، چونکه بەڕاستی نامەی کردەوەی تاوانباران له (سجین)دایه.
(٨) جا تۆ چووزانی (سجین) چیه؟
(٩) نامەیەکی (دیاری و ئاشکرایه هەر بەرواڵەتیدا دیاره که خێری تیادا نیه)، مۆرکراوو لۆك کراویشه.
(١٠) هاوارو ئاهوناڵه لەو ڕۆژەدا بۆ ئەوانەی بڕوایان نیه و، بەرنامەی خوا بەدرۆ دەزانن.
(١١) ئەوانەی که بڕوایان به ڕۆژی قیامەت و زیندوو بوونەوە نیه و هەمیشه بەدرۆی دەزانن.
(١٢) کەسیش بەرپا بوونی ئەو ڕۆژه بەدرۆ نازانێت، مەگەر هەموو ستەمکارێکی گوناهبار نەبێت.
(١٣) ئەوجۆره کەسانەی کاتێك ئایەت وفەرمانەکانی ئێمەیان بەسەردا دەخوێنرێتەوە، دەڵێن: ئەمه ئەفسانەی پێشینانه و (بەسەرچووه)..!!
(١٤) نەخێر، وانیه (ئەو نەفامانه تێناگەن و داناچڵەکێن)بەڵکو دڵیان ژەنگی هێناوەو چڵکی گوناه دایپۆشیوه له سەرەنجامی ئەو کاروکردەوانەی که دەیانکرد.
(١٥) نەخێر، ڕزگاربوونیان نی یه، چونکه بەڕاستی ئەو ڕۆژه بەربەست هەیه لەنێوان تاوانباران و پەروەردگاریاندا و بێ بەش دەبن لەبینینی ئەو زاته.
(١٦) لەوەودوا بێگومان دەخرێنه ناوئاگری دۆزەخەوه.
(١٧) پاشان پێیان دەوترێت: ئائەمه ئەو شوێنەیه که بڕواتان پێی نەبوو بەڕاستتان نەدەزانی.
(١٨) نەخێر (دەستەی سەرفرازان دوورن لەو تەنگانەیه) بەڵکو نامەی کردەوەکانیان، دۆسیەی ڕەفتاریان وا له شوێنه بەرزو بڵندەکاندا.
(١٩) جا تۆ چووزانی (علیون) چیەو چۆنه.
(٢٠) نامەیەکی (دیارو ئاشکرایه، هەر به ڕواڵەتیدا دیاره که خاوەنی سەرفرازو بەختەوەره) مۆرکراوو لۆك کراویشه.
(٢١) ئەو نامەیه فریشته نزیکه بەڕێزەکانی لای خوا دەیکەنەوەو (بەسەرسامی و خۆشیەوه سەرنجی چاکه و خواپەرستی چاکان دەدەن و) شایەتی لەسەر دەدەن.
(٢٢) بەڕاستی چاکان، خواناسان لەناو نازو نیعمەتدا ژیانی خۆشی و شادی دەبەنه سەر.
(٢٣) لەسەر کورسی و قەنەفه ڕازاوەکان تەماشای دەوروبەری خۆیان دەکەن (سەرنجی دیمەنی جوان و باخات و باخچه و گوڵ و گوڵزارو تاڤگه و ڕووبارو نازو نیعمەته نەبڕاوه و بێشومارەکان دەدەن).
(٢٤) خۆشی و خۆشگوزەرانی ناسك پەروەری له ڕووخساریاندا دەبینیت.
(٢٥) شەرابێکیان پێشکەش دەکرێت، که پاك و سەرمۆره.
(٢٦) که نۆشکرا بۆنی میسك ئەو ناوه پڕدەکات، (پێچەوانەی شەرابی دنیایه که بخۆرو دەوروبەریش بۆگەن دەکات)، جا با له پێناوی ئەوەدا پێشبڕکێکەران پێشبڕکێ بکەن.
(٢٧) هەروەها ئەو شەرابه ئاوێتەکەی له(تسنیم)ه،
(٢٨) (تسنیم)یش سەرچاوەیەکه تەنها خۆشەویستان و نزیککراوەکان لێی دەخۆنەوه.
(٢٩) بێگومان ئەوانەی که تاوانیان دەکرد گاڵتەیان به ئیمانداران دەهات و پێیان پێدەکەنین.
(٣٠) کاتێکیش بەلایاندا تێپەڕ بوونایه دەیانکرده چپەچپ و سرته سرت و به چاو ئیشارەتیان دەکرد.
(٣١) کاتێکیش دەگەڕانەوه بۆ ماڵەوه، بەدەم پێکەنین و گاڵتەوه دەگەڕانەوه (هەر باسیان دەکردن)...
(٣٢) کاتێکیش ئیمانداران دەبیننەوه، دەڵێن: بەڕاستی ئەوانه گومڕان و لەڕێگەی باو وباپیران لایانداوه!!
(٣٣) خۆ ئەو خوانەناسانه ڕەوانه نەکراون تا چاودێربن بەسەر ئیماندارانەوه.
(٣٤) (ئەمڕۆ ئیتر نۆرەی ئیماندارانه) جا ئەمڕۆ ئەوانەی باوەڕدار بوون بەکافران پێدەکەنن.

عَلَى ٱلْأَرَآئِكِ يَنظُرُونَ ﴿٣٥﴾ هَلْ ثُوِّبَ ٱلْكُفَّارُ مَا كَانُواْ يَفْعَلُونَ ﴿٣٦﴾

## سُورَةُ الانشِقَاق

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

إِذَا ٱلسَّمَآءُ ٱنشَقَّتْ ﴿١﴾ وَأَذِنَتْ لِرَبِّهَا وَحُقَّتْ ﴿٢﴾ وَإِذَا ٱلْأَرْضُ مُدَّتْ ﴿٣﴾ وَأَلْقَتْ مَا فِيهَا وَتَخَلَّتْ ﴿٤﴾ وَأَذِنَتْ لِرَبِّهَا وَحُقَّتْ ﴿٥﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلْإِنسَٰنُ إِنَّكَ كَادِحٌ إِلَىٰ رَبِّكَ كَدْحًا فَمُلَٰقِيهِ ﴿٦﴾ فَأَمَّا مَنْ أُوتِىَ كِتَٰبَهُۥ بِيَمِينِهِۦ ﴿٧﴾ فَسَوْفَ يُحَاسَبُ حِسَابًا يَسِيرًا ﴿٨﴾ وَيَنقَلِبُ إِلَىٰٓ أَهْلِهِۦ مَسْرُورًا ﴿٩﴾ وَأَمَّا مَنْ أُوتِىَ كِتَٰبَهُۥ وَرَآءَ ظَهْرِهِۦ ﴿١٠﴾ فَسَوْفَ يَدْعُواْ ثُبُورًا ﴿١١﴾ وَيَصْلَىٰ سَعِيرًا ﴿١٢﴾ إِنَّهُۥ كَانَ فِىٓ أَهْلِهِۦ مَسْرُورًا ﴿١٣﴾ إِنَّهُۥ ظَنَّ أَن لَّن يَحُورَ ﴿١٤﴾ بَلَىٰٓ إِنَّ رَبَّهُۥ كَانَ بِهِۦ بَصِيرًا ﴿١٥﴾ فَلَآ أُقْسِمُ بِٱلشَّفَقِ ﴿١٦﴾ وَٱلَّيْلِ وَمَا وَسَقَ ﴿١٧﴾ وَٱلْقَمَرِ إِذَا ٱتَّسَقَ ﴿١٨﴾ لَتَرْكَبُنَّ طَبَقًا عَن طَبَقٍ ﴿١٩﴾ فَمَا لَهُمْ لَا يُؤْمِنُونَ ﴿٢٠﴾ وَإِذَا قُرِئَ عَلَيْهِمُ ٱلْقُرْءَانُ لَا يَسْجُدُونَ ۩ ﴿٢١﴾ بَلِ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ يُكَذِّبُونَ ﴿٢٢﴾ وَٱللَّهُ أَعْلَمُ بِمَا يُوعُونَ ﴿٢٣﴾ فَبَشِّرْهُم بِعَذَابٍ أَلِيمٍ ﴿٢٤﴾ إِلَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ لَهُمْ أَجْرٌ غَيْرُ مَمْنُونٍ ﴿٢٥﴾

ربع الحزب ٩

سجدة

(٣٥) لەسەر کورسی و قەنەفە (رازاوەکان) تەماشا دەکەن (دۆزەخیەکان دەبینن لەسەر شاشەی تایبەتی پێیان دەڵێن):
(٣٦) باشە ئایا کافران پاداشتی ئەوەی کە دەیانکرد درانەوە؟!

سوورەتی (الإنشقاق)

بەناوی خوای بەخشندە و میهرەبان

(١) کاتێک دێت ئاسمان لەت و پەت دەبێت.
(٢) گوێڕایەڵی فەرمانی پەروەردگاری دەبێت، حەق وایە و پێویستە لەسەری ئاوا فەرمانبەردار بێت.
(٣) هەروەها کاتێک دێت زەویش پان و بەرین دەبێتەوە (تا جێگەی هەمووانی لەسەر ببێتەوە، کە ئەمە ئاماژەیە، بۆ تەخت بوونی).
(٤) هەرچی لەناویدا هەیە فڕێی دەداتە سەر رووکاری و خۆی خاڵی دەکات.
(٥) سەرنجی ئایەتی ـ ٢ ـ بدە.
(٦) ئەی ئینسان بەراستی تۆ خۆت زۆر ماندوو دەکەیت، زۆر رەنج و زەحمەت دەکێشیت، سەرئەنجامیش دەبێ بگەڕێیتەوە بۆ لای پەروەردگارت (تا پاداشتی رەنج و هەوڵەکەت وەربگریت).
(٧) جا ئەوەی دۆسیەی کردەوەکانی درایە دەستی راستی...
(٨) ئەوە لەمەودوا لێپرسینەوەیەکی زۆر ئاسانی لەگەڵدا دەکرێت.
(٩) بەدڵی خۆش و رووی خۆشەوە دەگەڕێتەوە بۆ ناو کەسوکاری چاکو خواناسی، بۆ ناو ئیماندارا‌ن (سەرەڕای حۆری و غلمان و ولدان.
(١٠) (بەڵام) ئەوەی دۆسیەی کردەوەکانی لە پشتیەوە درایە دەستی.
(١١) ئەوە لەمەولا هاوارو دادی لێبەرزدەبێتەوە و دەڵێت: خوایە مەرگ، خوایە بمکوژە، خوایە لەناوم بەرە.
(١٢) دەخرێتە ناو دۆزەخ.
(١٣) چونکە بەراستی ئەو جۆرە کەسە کاتی خۆی لەناو ماڵ و خێزانیدا بەکەیف و ئاهەنگی ناشەرعی، بە بەرپاکردنی سفرەو خوانی حەرام دڵی خۆش بوو (مەستی رابواردنی حەرام بوو).
(١٤) بڕوای وابوو کە هەرگیز زیندوو بوونەوە و گەڕانەوە و لێپرسینەوە نیە.
(١٥) نەخێر بەگومانی ئەو نەبوو، پەروەردگاری چاک ئاگاداری کارو کردەوەکانی بوو و دەیبینی چی دەکات.
(١٦) سوێندم (بەو کاتەی دوای خۆرئاوا بوون) ئاسۆ سوور هەڵدەگەڕێت.
(١٧) بە شەوو ئەوەی کە کۆی دەکاتەوە (شەوگار ئادەمیزاد لەماڵی خۆیدا و، گیاندارا‌ن لە شوێنی خۆیان و باڵندەکان لەهێلانەکانیاندا کۆدەکاتەوە). (١٨) بەمانگی چواردەش کاتێک تێرو تەواوو گەورە و درەخشان دەبێت.
(١٩) ئێوە تێدەپەڕن وگۆڕانکاری و حالاتی زۆرتان بەسەردێت (بۆ نموونە: لە منالی، بۆ لاوی، بۆ پیری، بۆ مەرگ، بۆ بەرزەخ، بۆ قیامەت، لەوەودواش بۆ بەهەشت یان دۆزەخ)، یاخود لە ساغی، بۆ نەخۆشی یان بەپێچەوانەوە.. لە هەژاریی، بۆ دەوڵەمەندی یان پێچەوانەوە، لە قیامەتیشدا لە بەهەشتدا ئیمانداران بەردەوام بەرەو تەواوترو چاکتر دەبرێن).
(٢٠) کەواتە، ئەو خوانەناسانە چیانە و بۆچی ئیمان ناهێنن؟
(٢١) کاتێک قورئانیش بەسەریاندا دەخوێنرێتەوە، سوژدە نابەن و ملکەچ نابن؟
(٢٢) دیارە کە بێباوەڕان بەردەوام راستیەکان بەدرۆ دەزانن، بەڵکو باوەڕی پێناکەن.
(٢٣) خوایش چاک ئاگاو زانایە بەوەی کە لە دڵ و دەروونیاندا شاردوویانەتەوە (لە بوغزو کینە و پیلان، دژی ئیسلام و موسڵمانان).
(٢٤) (کەواتە)، مژدەی ئازارو سزایەکی بەئێشیان پێبدە!!
(٢٥) جگە لەوانەی کە ئیمان و باوەڕیان هێناوە و کارو کردەوەی چاکیان ئەنجامداوە، پاداشتی نەبڕاوە و بێ منەت چاوەڕێیانە.

سُورَةُ البُرُوجِ

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

وَالسَّمَاءِ ذَاتِ الْبُرُوجِ ﴿١﴾ وَالْيَوْمِ الْمَوْعُودِ ﴿٢﴾ وَشَاهِدٍ وَمَشْهُودٍ ﴿٣﴾ قُتِلَ أَصْحَابُ الْأُخْدُودِ ﴿٤﴾ النَّارِ ذَاتِ الْوَقُودِ ﴿٥﴾ إِذْ هُمْ عَلَيْهَا قُعُودٌ ﴿٦﴾ وَهُمْ عَلَىٰ مَا يَفْعَلُونَ بِالْمُؤْمِنِينَ شُهُودٌ ﴿٧﴾ وَمَا نَقَمُوا مِنْهُمْ إِلَّا أَنْ يُؤْمِنُوا بِاللَّهِ الْعَزِيزِ الْحَمِيدِ ﴿٨﴾ الَّذِي لَهُ مُلْكُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ ۚ وَاللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ شَهِيدٌ ﴿٩﴾ إِنَّ الَّذِينَ فَتَنُوا الْمُؤْمِنِينَ وَالْمُؤْمِنَاتِ ثُمَّ لَمْ يَتُوبُوا فَلَهُمْ عَذَابُ جَهَنَّمَ وَلَهُمْ عَذَابُ الْحَرِيقِ ﴿١٠﴾ إِنَّ الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ لَهُمْ جَنَّاتٌ تَجْرِي مِنْ تَحْتِهَا الْأَنْهَارُ ۚ ذَٰلِكَ الْفَوْزُ الْكَبِيرُ ﴿١١﴾ إِنَّ بَطْشَ رَبِّكَ لَشَدِيدٌ ﴿١٢﴾ إِنَّهُ هُوَ يُبْدِئُ وَيُعِيدُ ﴿١٣﴾ وَهُوَ الْغَفُورُ الْوَدُودُ ﴿١٤﴾ ذُو الْعَرْشِ الْمَجِيدُ ﴿١٥﴾ فَعَّالٌ لِمَا يُرِيدُ ﴿١٦﴾ هَلْ أَتَاكَ حَدِيثُ الْجُنُودِ ﴿١٧﴾ فِرْعَوْنَ وَثَمُودَ ﴿١٨﴾ بَلِ الَّذِينَ كَفَرُوا فِي تَكْذِيبٍ ﴿١٩﴾ وَاللَّهُ مِنْ وَرَائِهِمْ مُحِيطٌ ﴿٢٠﴾ بَلْ هُوَ قُرْآنٌ مَجِيدٌ ﴿٢١﴾ فِي لَوْحٍ مَحْفُوظٍ ﴿٢٢﴾

سُورَةُ الطَّارِقِ

## سوورەتی (البـروج)

بەناوی خوای بەخشندە و میهرەبان

(١) سوێند بە ئاسمانی خاوەن ئەستێرە و هەسارەی گەورە...

(٢) بەو رۆژەی کە بەڵێن دراوە پێش بێت (واتە رۆژی قیامەت)...

(٣) بەشایەت و شایەتی لەسەردراوە، یاخود بە شایەت و بینراوەکان، (تاوانباران ئامادەن و هەرچی ئەنجامیانداوە تۆمار کراوە لەسەریان)

(٤) بەکوشت چن، نەفرینیان لێ بێت، ئەوانەی کە چاڵیان هەڵکەند (بۆ ئیمانداران)...

(٥) ئاگری داگیرساو و بەتینیان تێدا کردەوە...

(٦) ئەو کاتەی کە بەدەوریدا دانیشتبوون...

(٧) لە نزیکەوە چاودێری ئەو کارەساتەیان دەکرد کە بەسەر باوەڕدارانەدا دەهێنرێت و خۆیان لە نزیکەوە سەرپەرشتیان دەکرد.

(٨) ئەم رق و داخەیان لەئیمانداران تەنها لەبەر ئەوەبوو کە ئەوان باوەڕی بەتینیان دەهێنا بە خوای بالادەستی شایستەی سوپاسگوزاری...

(٩) ئەو زاتەی کە خاوەنی هەموو شتێکە لە ئاسمانەکان و زەویدا، ئەو خوایەی شایەتە لەسەر هەموو شتێك و ئاگای لە هەموو شتێکە.

(١٠) بەڕاستی ئەوانەی بەڵاو ناخۆشی وتەنگانە و پیلان دژی پیاوانی ئیمانداروو ئافرەتانی ئیماندار خستەکارو پاشان هەر بەردەوام دەبن و کۆڵ نادەن و پەشیمان نابنەوە سزای دۆزەخ و سزای سووتێنەر بۆ ئەوانەیە.

(١١) بەڕاستی ئەوانەی کە باوەڕیان هێناوە و کردەوە چاکەکانیان ئەنجام داوە باخەکانی بەهەشت کە چەندەها رووبار بەژێر درەختەکانیدا دەڕوات بۆیان ئامادەیە، هەر ئەوە خۆی لە خۆیدا سەرکەوتن و سەرفرازیەکی زۆر گەورە و بێسنوورو بێ وێنەیە.

(١٢) بەڕاستی تۆڵەی پەروەردگارت (ئەی پێغەمبەر ﷺ، ئەی ئیماندار) زۆر توندو تیژ و بەزەبرە.

(١٣) بەڕاستی هەر ئەوزاتەیە سەرەتا هەموو شتێکی دروست دەکات و دوای نەمانیشی دووبارە دروستی دەکاتەوە.

(١٤) هەر ئەویش زاتێکی زۆر لێخۆشبوو بەسۆزو دلۆڤان و دڵسۆزە (بۆ ئیمانداران).

(١٥) خاوەنی تەختی بڵند و بەرزو پایەدارە.

(١٦) هەرچی بیەوێت ئەنجامی دەدات، هەرچی بیەوێت کەس ناتوانێت دەست بهێنێتە رێی.

(١٧) ئایا هەواڵی لەشکرو سوپاکانت پێگەیشتووە؟ (ئەوانەی یاخی بوون لە پێغەمبەران و بەرنامەی یەکخواناسی).

(١٨) کە لەشکری فیرعەون و ثمودە.

(١٩) بەڵکو ئەوانەش کە بێباوەڕ بوون تەمێ نابن بەڵکو هەر سەرگەرمی بە درۆ لە قەڵەمدان و دژایەتی ئەم ئایین و بەرنامە و قورئانەن.

(٢٠) (بەڵام با بزانن)، دەسەڵاتی خوا لە پشتیانەوە دەورەی داون و لە دەستی دەرناچن.

(٢١) (ئەوەی ئەوان دژایەتی دەکەن) ئەم قورئانە بەرزو بڵندو پایەدارەیە.

(٢٢) کە لە لاپەڕەی تایبەتی و لەسەر تابلۆی پیرۆز، پارێزراوە لە (لوح المحفوظ) دا.

سوورەتی (الطـارق)

بەناوی خوای بەخشندە و میهرەبان

(١) سوێند بە ئاسمان و ئەو ئەستێرانەی بەشەودا دەردەکەون .
(٢) جا تۆ چووزانی (طارق) چیە.
(٣) ئەستێرەیەکە بە رووناکیەکەی تاریکی دەبڕێت.
(٤) (سوێند بەوانە) هیچ کەس نییە چاودێری نەبێت، (سەرەتا خوا چاودێری هەموانە، فریشتەکانیشی کردووە بە چاودێرو پارێزەرمان).
(٥) کەواتە با ئادەمیزاد تەماشا بکات و سەرنج بدات کە لە چی دروستکراوە؟!
(٦) دروستکراوە لە ئاوێکی هەڵقولاو (کە مەنی پیاوە و هێلکۆکەی ئافرەتە، هەردوولایان هەڵدەقوڵێن بۆ پێکهاتنی ئادەمیزاد، بەویستی خوا).
(٧) لە نێوان بڕبڕەکانی پشت و ئێسکەکانی سینەدا دەردەچێت.
(٨) بێگومان ئەو زاتە دووبارە (دروستکردنەوەی ئادەمیزادی) زۆر لانائاسانە و توانای تەواوی هەیە.
(٩) ئەو رۆژەی کە هەموو نهێنییەکان دەردەکەوێت و ئاشکرا دەکرێت.
(١٠) ئادەمیزاد هیچ هێزو پشتیوانیەکی نیە.
(١١) سوێند بە ئاسمانێک کە خاوەنی گێڕانەوەیە (سوڕی ئاو لە سروشتدا، شەپۆلەکانی تەلەفون و رادیۆ و تەلەفیزیۆن ...هتد).
(١٢) هەروەها سوێند بە زەوی کە درزی تێدەبێت بەهۆی رووەکەوە.
(١٣) بەڕاستی ئەم قورئانە گوفتارێکی جیاکەرەوەیە (جیاکەرەوەی حەق و ناحەق، راست و درۆ، چاک و خراپ و ...هتد).
(١٤) ئەم قورئانە گوفتارێکی گاڵتە نییە.
(١٥) بەڕاستی ئەوانە سەرگەرمی پیلانن و خەریکی داونانەوەن (بۆ ئیمانداران).
(١٦) (بەڵام خوا دەفەرموێت): منیش پلان و نەخشەی خۆم دەخەمەکار.
(١٧) کەواتە تۆش تاوێک مۆڵەتی بێ باوەڕان بدە، کەمێک لێیان بوەستە (بزانە چیان بەسەر دەهێنم).

سوورەتی (الأعلـى)

بەناوی خوای بەخشندە و میهرەبان

(١) تەسبیحات و ستایشی پەروەردگاری بەرزو بڵند و پایەدارت بکە.
(٢) ئەو زاتەی هەموو شتێکی دروستکردووە بەجوانی و رێکوپێک و تێرو تەواویی کردووە.
(٣) ئەو زاتەی کە نەخشەی کێشاوە بۆ هەموو شتێک و جا رێنموویی کردووە.
(٤) ئەوەی کە گژوگیای لە لەوەڕگا دەرهێناوە.
(٥) (بەڵام دوای ماوەیەک) دەیکاتە پووش و پەڵاشێکی زەرد و وشک و رەشهەڵگەڕاو.
(٦) (ئەی محمد ﷺ) ئێمە قورئانت لە رێگەی جوبرەئیلەوە بەسەردا دەخوێنینەوە، ئیتر هەرگیز بیرت ناچێت.
(٧) مەگەر شتێک ویستی خوای لەسەربێت، چونکە بەڕاستی خوا ئاگادارە بەو شتانەی کە ئاشکراو دیارن، یاخود شاراوەن.
(٨) جا دڵنیابە ئێمە یارمەتیت دەدەین بۆ ئەنجامدانی هەموو چاکەیەک، هەموو کارێکی لەبارت بۆ ئاسان دەکەین.
(٩) کەواتە تۆ ئیتر لەسەر یادخستنەوە و یادادەوەری ئەو کەسانە بەردەوام بە کە سوودیان وەرگرتووە و ئامادەن زیاتر تێبگەن.
(١٠) بێگومان ئەو کەسەی کە ترسی خوای لە دڵدا بێت یاداوەری وەردەگرێت.
(١١) خراپترین کەس خۆی لێ دوور دەگرێت...
(١٢) ئەوەی دەچێتە ناو ئاگرەکە گەورەکەوە و دەسوتێت تیایدا.
(١٣) لەوەودوا نە ئەوەیە بمرێت و (رزگاری ببێت، نە ئەوەشە کە) ژیانێکی ئاسایی بەسەر بەرێت.
(١٤) بێگومان ئەو کەسە سەرفرازە کە دەروونی خۆی پاک راگرتووە و...
(١٥) ناوی پەروەردگاری دەبات و نوێژی بۆ دەکات و کڕنووش و سوژدەی بۆ بردووە.

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

وَالسَّمَاءِ وَالطَّارِقِ ﴿١﴾ وَمَا أَدْرَاكَ مَا الطَّارِقُ ﴿٢﴾ النَّجْمُ الثَّاقِبُ ﴿٣﴾ إِن كُلُّ نَفْسٍ لَّمَّا عَلَيْهَا حَافِظٌ ﴿٤﴾ فَلْيَنظُرِ الْإِنسَانُ مِمَّ خُلِقَ ﴿٥﴾ خُلِقَ مِن مَّاءٍ دَافِقٍ ﴿٦﴾ يَخْرُجُ مِن بَيْنِ الصُّلْبِ وَالتَّرَائِبِ ﴿٧﴾ إِنَّهُ عَلَىٰ رَجْعِهِ لَقَادِرٌ ﴿٨﴾ يَوْمَ تُبْلَى السَّرَائِرُ ﴿٩﴾ فَمَا لَهُ مِن قُوَّةٍ وَلَا نَاصِرٍ ﴿١٠﴾ وَالسَّمَاءِ ذَاتِ الرَّجْعِ ﴿١١﴾ وَالْأَرْضِ ذَاتِ الصَّدْعِ ﴿١٢﴾ إِنَّهُ لَقَوْلٌ فَصْلٌ ﴿١٣﴾ وَمَا هُوَ بِالْهَزْلِ ﴿١٤﴾ إِنَّهُمْ يَكِيدُونَ كَيْدًا ﴿١٥﴾ وَأَكِيدُ كَيْدًا ﴿١٦﴾ فَمَهِّلِ الْكَافِرِينَ أَمْهِلْهُمْ رُوَيْدًا ﴿١٧﴾

سُورَةُ الأَعْلَى



بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

سَبِّحِ اسْمَ رَبِّكَ الْأَعْلَى ﴿١﴾ الَّذِي خَلَقَ فَسَوَّىٰ ﴿٢﴾ وَالَّذِي قَدَّرَ فَهَدَىٰ ﴿٣﴾ وَالَّذِي أَخْرَجَ الْمَرْعَىٰ ﴿٤﴾ فَجَعَلَهُ غُثَاءً أَحْوَىٰ ﴿٥﴾ سَنُقْرِئُكَ فَلَا تَنسَىٰ ﴿٦﴾ إِلَّا مَا شَاءَ اللَّهُ ۚ إِنَّهُ يَعْلَمُ الْجَهْرَ وَمَا يَخْفَىٰ ﴿٧﴾ وَنُيَسِّرُكَ لِلْيُسْرَىٰ ﴿٨﴾ فَذَكِّرْ إِن نَّفَعَتِ الذِّكْرَىٰ ﴿٩﴾ سَيَذَّكَّرُ مَن يَخْشَىٰ ﴿١٠﴾ وَيَتَجَنَّبُهَا الْأَشْقَى ﴿١١﴾ الَّذِي يَصْلَى النَّارَ الْكُبْرَىٰ ﴿١٢﴾ ثُمَّ لَا يَمُوتُ فِيهَا وَلَا يَحْيَىٰ ﴿١٣﴾ قَدْ أَفْلَحَ مَن تَزَكَّىٰ ﴿١٤﴾ وَذَكَرَ اسْمَ رَبِّهِ فَصَلَّىٰ ﴿١٥﴾

بَلْ تُؤْثِرُونَ ٱلْحَيَوٰةَ ٱلدُّنْيَا ﴿١٦﴾ وَٱلْـَٔاخِرَةُ خَيْرٌ وَأَبْقَىٰٓ ﴿١٧﴾ إِنَّ هَـٰذَا لَفِى ٱلصُّحُفِ ٱلْأُولَىٰ ﴿١٨﴾ صُحُفِ إِبْرَٰهِيمَ وَمُوسَىٰ ﴿١٩﴾

سُورَةُ الغَاشِيَةِ

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَـٰنِ ٱلرَّحِيمِ

هَلْ أَتَىٰكَ حَدِيثُ ٱلْغَـٰشِيَةِ ﴿١﴾ وُجُوهٌ يَوْمَئِذٍ خَـٰشِعَةٌ ﴿٢﴾ عَامِلَةٌ نَّاصِبَةٌ ﴿٣﴾ تَصْلَىٰ نَارًا حَامِيَةً ﴿٤﴾ تُسْقَىٰ مِنْ عَيْنٍ ءَانِيَةٍ ﴿٥﴾ لَّيْسَ لَهُمْ طَعَامٌ إِلَّا مِن ضَرِيعٍ ﴿٦﴾ لَّا يُسْمِنُ وَلَا يُغْنِى مِن جُوعٍ ﴿٧﴾ وُجُوهٌ يَوْمَئِذٍ نَّاعِمَةٌ ﴿٨﴾ لِّسَعْيِهَا رَاضِيَةٌ ﴿٩﴾ فِى جَنَّةٍ عَالِيَةٍ ﴿١٠﴾ لَّا تَسْمَعُ فِيهَا لَـٰغِيَةً ﴿١١﴾ فِيهَا عَيْنٌ جَارِيَةٌ ﴿١٢﴾ فِيهَا سُرُرٌ مَّرْفُوعَةٌ ﴿١٣﴾ وَأَكْوَابٌ مَّوْضُوعَةٌ ﴿١٤﴾ وَنَمَارِقُ مَصْفُوفَةٌ ﴿١٥﴾ وَزَرَابِىُّ مَبْثُوثَةٌ ﴿١٦﴾ أَفَلَا يَنظُرُونَ إِلَى ٱلْإِبِلِ كَيْفَ خُلِقَتْ ﴿١٧﴾ وَإِلَى ٱلسَّمَآءِ كَيْفَ رُفِعَتْ ﴿١٨﴾ وَإِلَى ٱلْجِبَالِ كَيْفَ نُصِبَتْ ﴿١٩﴾ وَإِلَى ٱلْأَرْضِ كَيْفَ سُطِحَتْ ﴿٢٠﴾ فَذَكِّرْ إِنَّمَآ أَنتَ مُذَكِّرٌ ﴿٢١﴾ لَّسْتَ عَلَيْهِم بِمُصَيْطِرٍ ﴿٢٢﴾ إِلَّا مَن تَوَلَّىٰ وَكَفَرَ ﴿٢٣﴾ فَيُعَذِّبُهُ ٱللَّهُ ٱلْعَذَابَ ٱلْأَكْبَرَ ﴿٢٤﴾ إِنَّ إِلَيْنَآ إِيَابَهُمْ ﴿٢٥﴾ ثُمَّ إِنَّ عَلَيْنَا حِسَابَهُم ﴿٢٦﴾

(١٦) کەچی ئێوە ڕێبازی ڕزگاری ناگرنە بەرو بەڵکو زیاتر ژیانی دنیاتان مەبەستە.
(١٧) لەکاتێکدا قیامەت و بەدەست هێنانی بەهەشت چاکترە و بەردەوامیشە (هەر بەراورد ناکرێت لەگەڵ تەمەنی کورتی دنیادا).
(١٨) بێگومان ئەم یادخستنەوانە لە پەڕاوە دێرینەکانیشدا باسکراوە.
(١٩) (لەوانە) کتێبە پیرۆزەکانی ئیبراهیم و موسا.

سورەتی (الغاشیة)

بەناوی خوای بەخشندە و میهرەبان

(١)ئایا هەواڵ و دەنگوباسی ڕۆژی قیامەتت پێگەیشتووە؟! (ڕۆژێکە سەختیەکەی هەموو کەسێک داگیر دەکات)
(٢) لەو ڕۆژەدا چەند ڕووخسارانێک خەجاڵەت و ڕەنگ زەرد و شەرمەزار و زەبوونن.
(٣) (هەریەک لە خاوەنی ئەو ڕووخسارانە) نیشکەرێکی شەکەت و ماندوون (بۆ بەدەستهێنانی دنیای دوور لە ئیمان).
(٤) دەچنە ناو ئاگرێکی سووتێنەرەوە (کە جەستەکە لەناو نابات بۆئەوەی هەر لە سزادا بمێنێتەوە).
(٥) لە سەرچاوەیەکی لە کوڵ و زۆر گەرم خواردنەوەی دەدرێتێ.
(٦) هیچ خۆراکیشیان نیە تەنها لە درکێکی وشک و تفت و تاڵ (جۆرە ڕوەکێکی بیابانیە بەتەڕی تەنها وشتر دەیخوات، بە وشکی وشتریش نایخوات).
(٧) نە ئەوەیە گۆشتی پێبگرن و پێی قەڵەو ببن، نە ئەوەشە پێی تێرببن.
(٨) لەولاشەوە ڕوخسارانێکی تر ناسک و ڕووخۆش و گەشاوە و ڕووناکن.
(٩) لە هەوڵ و کۆششەکانیان (بۆ بەدەستهێنانی ڕەزامەندی خوا لەدنیادا) ڕازی و ئاسوودەن.
(١٠) لە بەهەشتێکی بەرزو بڵندا ژیان دەبەنە سەر.
(١١) لەو شوێنەدا قسە و گوفتارێکی ناخۆش و نابەجێ نا بیستن.
(١٢) لەو بەهەشتەدا کانی و سەرچاوە و تاڤگەی ڕەوانی تێدایە.
(١٣) هەروەها چرپا و سیستەم و جێگەی حەوانەوەی بەرز و بڵند کراوەی لێیە.
(١٤) (لە نزیک ئەو بەختەوەرانەوە لە هەر کوێدا بن) کوپ و سوراحی و پەرداخی (جوان و ڕازاوە و نەخشین) دانراوە.
(١٥) هەروەها پشتی و سەرین و پاڵپشتی جوان و ڕازاوەی تیادایە کە بە ڕێکو پێکی ڕیزکراون.
(١٦) فەرش و ئۆرتە و ڕایەخی قەشەنگ و نەخشینی تیادا ڕاخراوە (هەموو کۆشک و تەلارو ڤێلاکانی پێڕازێنراوەتەوە).
(١٧) (ئینجا خوای دروستکار لە ڕوانگەی هەندێک دروستکراوانیەوە دەیەوێت بێ باوەڕان دابچڵەکێنێت)، بۆیە دەفەرموێت: ئایا ئەوە سەرنجی وشتر نادەن چۆن دروستکراوە؟! (قەبارەی، ملی درێژی، قاچە درێژەکانی کە بە سمێکی ئیسفنجی کۆتایی هاتووە، ئینجا خۆگرتنی لەسەر برسێتی و تینویەتی،....)
(١٨) ئایا سەرنجی ئاسمان نادەن چۆن بەرزکراوەتەوە (ئەو هەموو ئەستێرە و کاکەشان و هەسارە بێشوومارە دەورەی زەویداوە لە بڵندیەوە ڕاگیراون).
(١٩) ئەی سەرنجی کێوەکان نادەن، چۆن داکوتراون و دامەزرێنراون (ڕەگیان چووە بە ناخی زەویدا)؟!
(٢٠) ئەی سەرنجی دەشتەکانی زەوی نادەن چۆن تەخت کراوە (لەبار هێنراوە بۆ کشتوکاڵ و ڕێگەوبان و ژیان)؟!
(٢١) کەواتە (تۆ ئەی پێغەمبەر ﷺ) ئەم شتانە بخەرەوە یادیان و ئامۆژگاریان بکە، بەڕاستی تۆ هەر یادخەرەوەیت.
(٢٢) هیچ دەسەڵاتێکت نیە بەسەر دڵ و دەروونیاندا (تا بە زۆر باوەڕداریان بکەیت).
(٢٣) بەڵام ئەو کەسەی کە پشت هەڵکردووە و کوفر هەڵبژاردووە...
(٢٤) ئەوە خوا سزاو تۆڵەیەکی زۆرسەخت و بەئازارو بێ سنووریان لێ دەسێنێت.
(٢٥) بێگومان ئەوانە گەڕانەوەیان هەر بۆ لای ئێمە (بیانەوێت و نەیانەوێت).
(٢٦) لەوەودوایش بەڕاستی حساب و لێپرسینەوە و دادگاییان لەسەر ئێمەیە.

سورة الفجر

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

وَالْفَجْرِ ﴿١﴾ وَلَيَالٍ عَشْرٍ ﴿٢﴾ وَالشَّفْعِ وَالْوَتْرِ ﴿٣﴾ وَاللَّيْلِ إِذَا يَسْرِ ﴿٤﴾ هَلْ فِي ذَٰلِكَ قَسَمٌ لِّذِي حِجْرٍ ﴿٥﴾ أَلَمْ تَرَ كَيْفَ فَعَلَ رَبُّكَ بِعَادٍ ﴿٦﴾ إِرَمَ ذَاتِ الْعِمَادِ ﴿٧﴾ الَّتِي لَمْ يُخْلَقْ مِثْلُهَا فِي الْبِلَادِ ﴿٨﴾ وَثَمُودَ الَّذِينَ جَابُوا الصَّخْرَ بِالْوَادِ ﴿٩﴾ وَفِرْعَوْنَ ذِي الْأَوْتَادِ ﴿١٠﴾ الَّذِينَ طَغَوْا فِي الْبِلَادِ ﴿١١﴾ فَأَكْثَرُوا فِيهَا الْفَسَادَ ﴿١٢﴾ فَصَبَّ عَلَيْهِمْ رَبُّكَ سَوْطَ عَذَابٍ ﴿١٣﴾ إِنَّ رَبَّكَ لَبِالْمِرْصَادِ ﴿١٤﴾ فَأَمَّا الْإِنسَانُ إِذَا مَا ابْتَلَاهُ رَبُّهُ فَأَكْرَمَهُ وَنَعَّمَهُ فَيَقُولُ رَبِّي أَكْرَمَنِ ﴿١٥﴾ وَأَمَّا إِذَا مَا ابْتَلَاهُ فَقَدَرَ عَلَيْهِ رِزْقَهُ فَيَقُولُ رَبِّي أَهَانَنِ ﴿١٦﴾ كَلَّا بَل لَّا تُكْرِمُونَ الْيَتِيمَ ﴿١٧﴾ وَلَا تَحَاضُّونَ عَلَىٰ طَعَامِ الْمِسْكِينِ ﴿١٨﴾ وَتَأْكُلُونَ التُّرَاثَ أَكْلًا لَّمًّا ﴿١٩﴾ وَتُحِبُّونَ الْمَالَ حُبًّا جَمًّا ﴿٢٠﴾ كَلَّا إِذَا دُكَّتِ الْأَرْضُ دَكًّا دَكًّا ﴿٢١﴾ وَجَاءَ رَبُّكَ وَالْمَلَكُ صَفًّا صَفًّا ﴿٢٢﴾ وَجِيءَ يَوْمَئِذٍ بِجَهَنَّمَ يَوْمَئِذٍ يَتَذَكَّرُ الْإِنسَانُ وَأَنَّىٰ لَهُ الذِّكْرَىٰ ﴿٢٣﴾

## سورەتی (الفجــر)

بەناوی خوای بەخشندە و میهرەبان

(١) سوێند بە بەرەبەیان.

(٢) سوێندم بەو شەوانەی کە دە شەون (هەندێک دەڵێن دە شەوی کۆتایی رەمەزانە، هەندێکیش دەڵێن دە شەوی سەرەتای مانگی ذي‌الحجەیە کە کاتی ئەنجامدانی حەجە، هەردوو بۆنەکەش پیرۆزن).

(٣) سوێند بە ئەو شتانە کە جوتن، هەروەها سوێند بە هەموو ئەو شتانەی کە تاکن (یاخود سوێند بە شەوە جووت و شەوە تاکەکان).

(٤) بە هەموو شەوێک کاتێک تێدەپەڕێت (لە سەرەنجامی سوڕانەوەی زەوی بەدەوری خۆیدا).

(٥) ئایا لەو شتانەدا سوێندی شایستە نییە بۆ کەسێک خاوەنی عەقڵ و بیروهۆش بێت؟!

(٦) ئایا نەتزانیووە پەروەردگاری تۆ چی کرد بە هۆزی عاد.

(٧) کە ئەویش هۆزی (ارم) و خاوەنی پایەی بەرزو کۆڵەکە و نیرگەی درێژ بوون (قەومی عاد لە شاری ئیرەم کە باڵابەرزو تێکسمراو بوون، خانووبەرە و کۆشک و تەلاری گەورە و بەرزیان دروست دەکرد).

(٨) لە سەردەمی ئەواندا لە هیچ شارو شوێنێکدا، کۆشک و تەلاری وەک ئەوەی ئەوان دروست نەکراوە.

(٩) ئایا نەتزانیووە قەومی ثمودیش خوا چی لێکردن، ئەوانەی لە دۆڵ و شیوەکانەوە بەردیان دەتاشی و دەیانگواستەوە بۆ ناو قەدی چیاکان و لەوێ خانوویان دروست دەکرد؟

(١٠) هەروەها فیرعەونی خاوەن ئەهرامەکان، (چ کۆشک و بینایەکی مەحکەمیان وەکو مێخ دادەکوتی بە زەویدا).

(١١) ئەوانەی کە ستەمیان بەرپاکرد لە وڵاتداو خەڵکیان دەچەوسانەوە.

(١٢) جا خراپە و تاوان و گوناهی زۆریان ئەنجامدەدا.

(١٣) (دوای ماوەیەکی دیاریکراو) پەروەردگاری تۆ سزاو خەشم و قینی خۆی رژاند بەسەریاندا و تەفرو تونای کردن.

(١٤) بەراستی پەروەردگاری تۆ هەمیشە و بەردەوام ئامادەیە کە تۆڵە لە ستەمکاران بسێنێت.

(١٥) جاکاتێک ئادەمیزاد لەلایەن پەروەردگاریەوە تاقی دەکرێتەوە، رێزی لێ دەنێت و نازو نیعمەتی بەسەردا دەڕێژێت، دەڵێت: (بە خوا وا دیارە) پەروەردگارم خۆشی دەوێم رێزم هەیە لای.

(١٦) بەڵام کاتێک تاقی دەکاتەوە و رزق و رۆزی کەمی پێدەبەخشێت و لێی دەگرێتەوە دەڵێت: وا دیارە پەروەردگارم منی خۆش ناوێت و رقی لێمە و ریسوای کردووم.

(١٧) نەخێر ئەو شتانە، هیچی وا نیە، (نەبەخشین مانای رێزو قەدرە، نەلێگرتنەوە مانای بێ رێزی و بێ قەدرییە، بەڵکو ئێوە (سەرەڕای ئەو بیرو بۆچوونە چەوتانەتان) رێزی هەتیو ناگرن و نازی پێنادەن.

(١٨) هانی یەکتر نادەن بۆ ئەوەی خۆراک ببەخشن بەهەژار و نەداران.

(١٩) میراتی دەخۆن و هەمووی دەماشنەوە (حەقی خزمان و نەدارانی لێ نادەن).

(٢٠) ماڵ و سامان و دارایشتان زۆر خۆشدەوێت (رەچاوی حەلاڵ و حەرام ناکەن).

(٢١) نەخێر، (هەر ئاوا بۆتان نالوێت)، کاتێک دێت کە زەوی ورد وخاش دەکرێت و لەناکاو دەدرێت بەیەکدا.

(٢٢) پەروەردگارت دێت و فریشتەکانیش پۆل پۆل (هاتنی پەروەردگاری مەزن خۆی نەبێت کەس نازانێت چۆنە).

(٢٣) ئەو رۆژە دۆزەخ دەهێنرێت و نیشان دەدرێت، جا ئەو رۆژە (ئادەمیزادی بێباوەڕ) دەزانێت چ پەندێکی بەسەر خۆی هێناوە، بەڵام تازە بەخۆدا هاتنەوە و پەشیمانی هیچ سوودێکی نیە و دادی نادات؟!

يَقُولُ يَٰلَيۡتَنِي قَدَّمۡتُ لِحَيَاتِي ﴿٢٤﴾ فَيَوۡمَئِذٖ لَّا يُعَذِّبُ عَذَابَهُۥٓ أَحَدٞ ﴿٢٥﴾ وَلَا يُوثِقُ وَثَاقَهُۥٓ أَحَدٞ ﴿٢٦﴾ يَٰٓأَيَّتُهَا ٱلنَّفۡسُ ٱلۡمُطۡمَئِنَّةُ ﴿٢٧﴾ ٱرۡجِعِيٓ إِلَىٰ رَبِّكِ رَاضِيَةٗ مَّرۡضِيَّةٗ ﴿٢٨﴾ فَٱدۡخُلِي فِي عِبَٰدِي ﴿٢٩﴾ وَٱدۡخُلِي جَنَّتِي ﴿٣٠﴾

سُورَةُ البَلَدِ

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

لَآ أُقۡسِمُ بِهَٰذَا ٱلۡبَلَدِ ﴿١﴾ وَأَنتَ حِلُّۢ بِهَٰذَا ٱلۡبَلَدِ ﴿٢﴾ وَوَالِدٖ وَمَا وَلَدَ ﴿٣﴾ لَقَدۡ خَلَقۡنَا ٱلۡإِنسَٰنَ فِي كَبَدٍ ﴿٤﴾ أَيَحۡسَبُ أَن لَّن يَقۡدِرَ عَلَيۡهِ أَحَدٞ ﴿٥﴾ يَقُولُ أَهۡلَكۡتُ مَالٗا لُّبَدًا ﴿٦﴾ أَيَحۡسَبُ أَن لَّمۡ يَرَهُۥٓ أَحَدٌ ﴿٧﴾ أَلَمۡ نَجۡعَل لَّهُۥ عَيۡنَيۡنِ ﴿٨﴾ وَلِسَانٗا وَشَفَتَيۡنِ ﴿٩﴾ وَهَدَيۡنَٰهُ ٱلنَّجۡدَيۡنِ ﴿١٠﴾ فَلَا ٱقۡتَحَمَ ٱلۡعَقَبَةَ ﴿١١﴾ وَمَآ أَدۡرَىٰكَ مَا ٱلۡعَقَبَةُ ﴿١٢﴾ فَكُّ رَقَبَةٍ ﴿١٣﴾ أَوۡ إِطۡعَٰمٞ فِي يَوۡمٖ ذِي مَسۡغَبَةٖ ﴿١٤﴾ يَتِيمٗا ذَا مَقۡرَبَةٍ ﴿١٥﴾ أَوۡ مِسۡكِينٗا ذَا مَتۡرَبَةٖ ﴿١٦﴾ ثُمَّ كَانَ مِنَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَتَوَاصَوۡاْ بِٱلصَّبۡرِ وَتَوَاصَوۡاْ بِٱلۡمَرۡحَمَةِ ﴿١٧﴾ أُوْلَٰٓئِكَ أَصۡحَٰبُ ٱلۡمَيۡمَنَةِ ﴿١٨﴾ وَٱلَّذِينَ كَفَرُواْ بِـَٔايَٰتِنَا هُمۡ أَصۡحَٰبُ ٱلۡمَشۡـَٔمَةِ ﴿١٩﴾ عَلَيۡهِمۡ نَارٞ مُّؤۡصَدَةُۢ ﴿٢٠﴾

سُورَةُ الشَّمۡسِ



(٢٤) (ئەوسا بە کەساسی و هەناسەی ساردەوە) دەڵێت: خۆزگە بۆ ئەم ژیانەم دەست پێشخەریم بکردایە.
(٢٥) جا ئیتر ئەو ڕۆژە کەس وەکو خوا بەخەشم و قین نیە لە بێ باوەڕان، لەبەرئەوە سزایەکیان دەدات کە کەس ناتوانێت سزای لەو چەشنە بدات.
(٢٦) کەسیش وەکو ئەو زاتە (بێ باوەڕان) نابەستێتەوە و بەندیان ناکات.
(٢٧) (شایانی باسە بە ئیمانداری پەرفراز لە سەرەمەرگدا دەوترێت) ئەی خاوەنی دڵ و دەروونی پڕ لە ئارامی (ئەی ئادەمیزادی ژیر و هۆشمەند کە لە تەمەنی کۆتای دنیادا پەروەردگارت ناسی و بەجوانی دەتپەرست...)
(٢٨) بگەڕێرەوە بۆ لای پەروەردگارت کە تۆ لەو ڕازیت و ئەویش لە تۆ ڕازیە.
(٢٩) دە بچۆرە ریزی بەندە چاکە نازدارو بەڕێزەکانمەوە
(٣٠) بچۆرە بەهەشتە خۆشە ڕازاوەکەمەوە.

سوورەتی (البلـد)

بەناوی خوای بەخشندە و میهرەبان

(١) سوێندم بەم شارە (واتە شاری مەککە).
(٢) لەکاتێکدا تۆ نیشتەجێی تیایدا.
(٣) سوێند بە باوک و ڕۆڵەکەی.
(٤) (سوێند بەوانە) بەڕاستی ئێمە ئینسانمان دروست کردووە و بەردەوام لە ناڕەحەتی و سەغڵەتی و کێشە و ناخۆشیدا..
(٥) ئایا ئادەمیزاد وادەزانێت کە هەرگیز کەس دەسەڵاتی بەسەریدا نابێت؟
(٦) (زۆرجار) دەڵێت: من پارەی زۆرم لەناوداوە!! من ماڵی زۆرم خەرج کردووە!!
(٧) ئایا وادەزانێت کەس ئاگاداری نیەو نەیبینیووە (کە ئەو سەرمایەیەی لەکوێوە پەیداکردووە و لەچیدا خەرجی کردووە؟!).
(٨) ئایا جووتێک چاومان پێنەبەخشیووە؟ (چاو: زۆر گرنگترە لە دوو دەزگای کامێرای ئەلەکترۆنی خودکار لە هەر چرکەیەکدا هەزاران وێنەی ڕەنگاو ڕەنگ دەگرێت و دەینێرێت بۆ مێشک، ئەویش هەندێکی هەڵدەگرێت).
(٩) هەروەها زمان و دوو لێوەشمان پێ نەبەخشیووە؟
(١٠) ئایا بە منداڵی ڕێنموویمان نەکردووە بۆ ئەوەی شیر لە مەمکەکانی دایکی بخوات؟، لە گەورەییشدا بۆ ئەوەی سەرپشک بێت لە شوێنکەوتنی ڕێبازی ڕاست، یان چەوت؟!
(١١) کەچی (زۆربەی ئەوخەڵکە) نەیتوانی بەسەر کۆسپ و لەمپەرەکاندا زاڵ ببێت و ڕێگای سەرفەرازی بگرێتەبەر.
(١٢) جا تۆ چووزانی ئەو کۆسپ و لەمپەرانە کامەن؟!...
(١٣) ئازادکردنی بەندە و کۆیلەیە (یان ئازادکردنی گەردنی خۆیەتی لە گوناهو یاخی بوون و سەرکەشی).
(١٤) یاخود خۆراک بەخشینە لە ڕۆژێکدا کە گرانی و برسێتی هەبێت.
(١٥) بەتایبەتی بەو هەتیوەی کەخزمایەتی هەیە لەگەڵیدا.
(١٦) یان بە هەژارێک کە لە هەژاریدا لەسەر خاک دانیشێت، یان پەککەوتە و کەفتەکارێک.
(١٧) سەرەڕای ئەوانەش ئادەمیزاد دەبێت لەوانەبێت کە باوەڕیان هێناوە و ئامۆژگاری یەکتریان کردووە لەسەر خۆگری و ئارامگری و هەروەها ئامۆژگاری یەکتریان کردووە لەسەر ڕەحم و بەزەیی و میهرەبانی.
(١٨) (ئەوانەی بەو سیفەتە جوانانە خۆیان دەڕازێننەوە) ئەوانە دەستەی ڕاست و (دەستەی بەختەوەرانن).
(١٩) ئەوانەش کە باوەڕیان بە ئایەت و فەرمانەکانی ئێمە نەبووە، ئەوانە دەستەی خوارو چەپ و چەوت و ناڵەباران، دەستەی نەگبەت و سەرلێشێواوەکانن.
(٢٠) ئەوانە دەرگا و قاپیەکانی دۆزەخ لەسەریان داخراوە و هیچ هیوایەکی ڕزگارییان نیە.

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

وَالشَّمْسِ وَضُحَاهَا ﴿١﴾ وَالْقَمَرِ إِذَا تَلَاهَا ﴿٢﴾ وَالنَّهَارِ إِذَا جَلَّاهَا ﴿٣﴾ وَاللَّيْلِ إِذَا يَغْشَاهَا ﴿٤﴾ وَالسَّمَاءِ وَمَا بَنَاهَا ﴿٥﴾ وَالْأَرْضِ وَمَا طَحَاهَا ﴿٦﴾ وَنَفْسٍ وَمَا سَوَّاهَا ﴿٧﴾ فَأَلْهَمَهَا فُجُورَهَا وَتَقْوَاهَا ﴿٨﴾ قَدْ أَفْلَحَ مَن زَكَّاهَا ﴿٩﴾ وَقَدْ خَابَ مَن دَسَّاهَا ﴿١٠﴾ كَذَّبَتْ ثَمُودُ بِطَغْوَاهَا ﴿١١﴾ إِذِ انبَعَثَ أَشْقَاهَا ﴿١٢﴾ فَقَالَ لَهُمْ رَسُولُ اللَّهِ نَاقَةَ اللَّهِ وَسُقْيَاهَا ﴿١٣﴾ فَكَذَّبُوهُ فَعَقَرُوهَا فَدَمْدَمَ عَلَيْهِمْ رَبُّهُم بِذَنبِهِمْ فَسَوَّاهَا ﴿١٤﴾ وَلَا يَخَافُ عُقْبَاهَا ﴿١٥﴾

سُورَةُ اللَّيْلِ

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

وَاللَّيْلِ إِذَا يَغْشَىٰ ﴿١﴾ وَالنَّهَارِ إِذَا تَجَلَّىٰ ﴿٢﴾ وَمَا خَلَقَ الذَّكَرَ وَالْأُنثَىٰ ﴿٣﴾ إِنَّ سَعْيَكُمْ لَشَتَّىٰ ﴿٤﴾ فَأَمَّا مَنْ أَعْطَىٰ وَاتَّقَىٰ ﴿٥﴾ وَصَدَّقَ بِالْحُسْنَىٰ ﴿٦﴾ فَسَنُيَسِّرُهُ لِلْيُسْرَىٰ ﴿٧﴾ وَأَمَّا مَن بَخِلَ وَاسْتَغْنَىٰ ﴿٨﴾ وَكَذَّبَ بِالْحُسْنَىٰ ﴿٩﴾ فَسَنُيَسِّرُهُ لِلْعُسْرَىٰ ﴿١٠﴾ وَمَا يُغْنِي عَنْهُ مَالُهُ إِذَا تَرَدَّىٰ ﴿١١﴾ إِنَّ عَلَيْنَا لَلْهُدَىٰ ﴿١٢﴾ وَإِنَّ لَنَا لَلْآخِرَةَ وَالْأُولَىٰ ﴿١٣﴾ فَأَنذَرْتُكُمْ نَارًا تَلَظَّىٰ ﴿١٤﴾

## سورەتی (الشمس)

بەناوی خوای بەخشندە و میهرەبان

(١) سوێند بە خۆرو تیشكی خۆر(كە لە سەرەتایی رۆژدا سەرهەڵدەدا).
(٢) سوێند بەمانگ، كاتێك بەشوێنیدا دێت.
(٣) سوێند بەرۆژ كاتێك كە خۆر دەردەخات.
(٤) سوێند بە شەو كە خۆر دادەپۆشێت.
(٥) سوێند بە ئاسمان و بەو زاتە بەدەسەڵاتەی دروستی كردووە.
(٦) سوێند بە زەوی و بەو زاتەی كە بەشێوەی هێلكەیی دایناوە.
(٧) سوێند بە دەروون و ئەو زاتەی كە بە رێكو پێكی بەدیهێناوە.
(٨) جا توانای خراپەو چاكە و خوانەناسی و خواناسی تێدا دابین كردووە.
(٩) (سوێند بەوانە هەموو) بەراستی ئەو كەسە سەرفرازە كە نەفسی پاك و پوختە كردووە و ئیمان و ترسی خوای تیادا ڕواندووە.
(١٠) بێگومان نائومێدبوو ئەوكەسەی نەفسی خۆی ناپوخت كرد و ئالودەی گوناهو تاوان و خراپەی كرد.
(١١) قەومی ثمود بەهۆی سەركەشی و یاخی بوونیانەوە، بڕوایان بە پێغەمبەرەكەیان نەهێنا.
(١٢) كاتێك شەقاوە و خوانەناسترین كەسیان خۆی ڕاپسكاند (بۆ سەربڕینی وشترەكە).
(١٣) جا پێغەمبەری خوا (صالح) پێی وتن: واز بهێنن لەم وشترە كە موعجیزەی خوایە، مۆڵەتی بدەن لە نۆرە ئاوەكەی خۆیدا ئاو بخواتەوە.
(١٤) كەچی بڕوایان بە هەڕەشەكانی نەكرد، ئینجا وشترەكەیان سەربڕی، ئەوسا ئیتر پەروەردگاریان وڵاتی كاولكردن و لەگەڵ زەویدا تەختی كرد بەسەریاندا و كەسیان ڕزگاری نەبوو (بەهۆی گوناهو تاوانیانەوە).
(١٥) لەكاتێكدا كە خوای بەدەسەڵات لە سەرەنجامی ئەو كارەیشی هەرگیز ناترسێت.

## سوورەتی (الليل)

بەناوی خوای بەخشندە و میهرەبان

(١) سوێند بە شەو كاتێك دنیا دادەگرێت...
(٢) بە ڕۆژ كاتێك دنیا ڕووناك دەبێت و تاریكی دەڕەوێنێتەوە.
(٣) سوێند بەو زاتەی كە نێرو مێی دروست كردووە.
(٤) بەڕاستی هەوڵ و كۆششی ئێوە جۆراو جۆرە (هەتانە هەوڵ و كۆششی بۆ بەدەستهێنانی بەهەشتە، هەتانە بەپێچەوانەوە بە دەست و بردە بۆ ئەنجامدانی تاوان و خراپكاری، هەتانە گوێڕایەڵ و هەتانە یاخی... هتد).
(٥) جا ئەوەی(ماڵ و سامان و زانستی و ...هتد) دەبەخشێت و پارێزكار و لەخواترسە....
(٦) بڕوای بتەوی بە پاداشتی چاك و بەنرخی خوایی هەیە...
(٧) ئەوە ڕێگەی چاكە و چاكەكاری بۆ ئاسان دەكەین و سەرئەنجام دەیخەینە خێرو خۆشیەوە.
(٨) بەڵام ئەوەی ڕەزیل و دەست نوقاو بێت و خۆی بێنیاز بزانێت و (ڕەزامەندی خوایی مەبەست نەبێت)...
(٩) بڕوای نەبێت بە پاداشت و بەهرەی چاكی خوایی و بەدرۆی بزانێت...
(١٠) ئەوە ئێمە ڕێبازی تەنگانە و ناخۆشی بۆ ئاسان دەكەین و سەرئەنجام بە دۆزەخی دەگەیەنین.
(١١) ئەو كاتەی كە دەمرێت و لە گۆڕ دەنرێت، ئەو كاتەش كە فڕێ دەدرێتە دۆزەخەوە ماڵ و سامان هیچ فریای ناكەوێت.
(١٢) بەڕاستی ڕوون كردنەوەی ڕێبازی هیدایەت و دیاریكردنی بۆ خەڵكی لەسەر ئێمەیە.
(١٣) بێگومان دەسەڵاتی بێسنوورمان هەیە بەسەر پاشەڕۆژ و قیامەتدا، هەروەها بەسەر دنیادا.
(١٤) جا من ئەوەتە ئاگادارتان دەكەم و دەتانترسێنم لە ئاگرێك كە زۆر بڵێسە دەسێنێت.

لَا يَصْلَىٰهَآ إِلَّا ٱلْأَشْقَى ﴿١٥﴾ ٱلَّذِى كَذَّبَ وَتَوَلَّىٰ ﴿١٦﴾ وَسَيُجَنَّبُهَا ٱلْأَتْقَى ﴿١٧﴾ ٱلَّذِى يُؤْتِى مَالَهُۥ يَتَزَكَّىٰ ﴿١٨﴾ وَمَا لِأَحَدٍ عِندَهُۥ مِن نِّعْمَةٍ تُجْزَىٰٓ ﴿١٩﴾ إِلَّا ٱبْتِغَآءَ وَجْهِ رَبِّهِ ٱلْأَعْلَىٰ ﴿٢٠﴾ وَلَسَوْفَ يَرْضَىٰ ﴿٢١﴾

سُورَةُ الضُّحَىٰ

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

وَٱلضُّحَىٰ ﴿١﴾ وَٱلَّيْلِ إِذَا سَجَىٰ ﴿٢﴾ مَا وَدَّعَكَ رَبُّكَ وَمَا قَلَىٰ ﴿٣﴾ وَلَلْءَاخِرَةُ خَيْرٌ لَّكَ مِنَ ٱلْأُولَىٰ ﴿٤﴾ وَلَسَوْفَ يُعْطِيكَ رَبُّكَ فَتَرْضَىٰٓ ﴿٥﴾ أَلَمْ يَجِدْكَ يَتِيمًا فَـَٔاوَىٰ ﴿٦﴾ وَوَجَدَكَ ضَآلًّا فَهَدَىٰ ﴿٧﴾ وَوَجَدَكَ عَآئِلًا فَأَغْنَىٰ ﴿٨﴾ فَأَمَّا ٱلْيَتِيمَ فَلَا تَقْهَرْ ﴿٩﴾ وَأَمَّا ٱلسَّآئِلَ فَلَا تَنْهَرْ ﴿١٠﴾ وَأَمَّا بِنِعْمَةِ رَبِّكَ فَحَدِّثْ ﴿١١﴾

سُورَةُ الشَّرْحِ



بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

أَلَمْ نَشْرَحْ لَكَ صَدْرَكَ ﴿١﴾ وَوَضَعْنَا عَنكَ وِزْرَكَ ﴿٢﴾ ٱلَّذِىٓ أَنقَضَ ظَهْرَكَ ﴿٣﴾ وَرَفَعْنَا لَكَ ذِكْرَكَ ﴿٤﴾ فَإِنَّ مَعَ ٱلْعُسْرِ يُسْرًا ﴿٥﴾ إِنَّ مَعَ ٱلْعُسْرِ يُسْرًا ﴿٦﴾ فَإِذَا فَرَغْتَ فَٱنصَبْ ﴿٧﴾ وَإِلَىٰ رَبِّكَ فَٱرْغَب ﴿٨﴾

(١٥) ناچێتە ناوی مەگەر کەسانی ناپوخت و دڕندە و خوانەناس نەبێت...
(١٦) ئەوەی حەقیقەت و ڕاستی بە درۆ داناوە و پشتی هەڵکردووە (لە بەرنامەی خوا).
(١٧) جا خواناس و پارێزکاران لەو سزاو ئاگرو ناخۆشیە دوور دەخرێنەوە.
(١٨) ئەوجۆرە کەسەی ماڵ و سامانی دەبەخشێت بەوە دڵ و دەروونی خۆی خاوێن رادەگرێت...
(١٩) لەکاتێکدا کەکەس چاکەیەکی وای بەسەریەوە نی یە کە پاداشت بدرێتەوە.
(٢٠) (چونکە) تەنها مەبەستی بەدەستهێنانی ڕەزامەندیی پەروەردگاری بەرزو بڵندە.
(٢١) سوێند بەخوا رازی و خۆشنوود دەبێت پێی.

سوورەتی (الضحى)

بەناوی خوای بەخشندە و میهرەبان

(١) سوێند بە چێشتەنگاو (کاتێک خۆر بەرز دەبێتەوە و کاتی جوڵە و چالاکیە).
(٢) سوێند بە شەو کاتێک بەتاریکیەکەی زەوی دادەپۆشێت.
(٣) پەروەردگارت دەستبەرداری تۆ نەبووە و وازی لەتۆ نەهێناوە و خەشمی لی نەگرتووێت (ماوەیەک وەحی نەهات بۆ پێغەمبەر ﷺ کافرانی قورەیش وتیان، پەروەردگاری محمد وازی لێ هێناوە، ئیتر خوای گەورە بەدرۆی خستنەوە).
(٤) بێگومان قیامەت و دوارۆژ چاکترە بۆ تۆ لە دنیا.
(٥) لەئایندەدا پەروەردگارت ئەوەندە نازونیعمەتت پێدەبەخشێت کە زۆر پێی رازی و خۆشنوود دەبیت.
(٦) ئایا پەروەردگارت نەیبینیت بەهەتیوی و خێرا دەرووی لێکردیتەوە و لانەی بۆ سازاندیت و حەواندیتیەوە؟!
(٧) ئەی سەرگەردان نەبوویت و نەت دەزانی چی بکەیت، هیدایەتی دایت و ڕێنموویی کردیت؟!
(٨) ئەی نەیبینیت کە هەژارو نەداریت، جا ماڵ و سامانی پێبەخشیت و دەوڵەمەندی کردیت و بێ نیازی کردیت؟!
(٩) کەواتە تۆش (ئەی پێغەمبەر ﷺ، ئەی ئیماندار) هەتیو مەچەوسێنەرەوەو دڵی مەڕەنجێنە.
(١٠) هەڵمەشاخێ بە هەژار و داماو و سواڵکەراندا.
(١١) (بەڵکو) دەربارەی نازو نیعمەتەکانی پەروەردگارت هەمیشە بدوێ و باسیان بکە لە جێی خۆیاندا بەکاریان بهێنە.

سوورەتی (الشرح)

بەناوی خوای بەخشندە و میهرەبان

(١)(ئەی محمد ﷺ) ئایا دڵ و دەروون و سینەمان گوشاد و ئاسوودە نەکردیت؟!
(٢) ئایا باری گرانمان لەسەر شانی تۆ لانەبرد؟!
(٣) ئەوەی کە پشتی تۆی هیلاک و ماندووکردبوو؟!
(٤) ناوو ئاوبانگی تۆمان بەرزو بڵند نەکردەوە (لە شایەتماندا هاوڕێ لەگەڵ ناوی ئێمەدا ناوت دەبرێت، ناوت لەسەر زاری فریشتە و پەری و گرۆی ئادەمیزادە).
(٥) بەڕاستی هاوڕێ لەگەڵ تەنگانەدا خۆشی و ئاسوودەیی دێت.
(٦) بێگومان بە دڵنیاییەوە هاوڕێ لەگەڵ تەنگانەدا خۆشی و ئاسوودەیی هەر دەبێت.
(٧) جا کاتێک لەکارێکی خێر دەبیتەوە، خۆت ماندوو بکە بەکارێکی خێری ترەوە.
(٨) با هەمیشە و بەردەوام حەزو ئارەزووت بۆ بەدەستهێنانی ڕەزامەندی خوا بێت، بەردەوام خەڵکیش هان بدە تا پەروەردگارت بناسن و لە هەوڵی ڕەزامەندی ئەودا بن.

سُورَةُ التِّين

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

وَٱلتِّينِ وَٱلزَّيْتُونِ ﴿١﴾ وَطُورِ سِينِينَ ﴿٢﴾ وَهَٰذَا ٱلْبَلَدِ ٱلْأَمِينِ ﴿٣﴾ لَقَدْ خَلَقْنَا ٱلْإِنسَٰنَ فِىٓ أَحْسَنِ تَقْوِيمٍ ﴿٤﴾ ثُمَّ رَدَدْنَٰهُ أَسْفَلَ سَٰفِلِينَ ﴿٥﴾ إِلَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ فَلَهُمْ أَجْرٌ غَيْرُ مَمْنُونٍ ﴿٦﴾ فَمَا يُكَذِّبُكَ بَعْدُ بِٱلدِّينِ ﴿٧﴾ أَلَيْسَ ٱللَّهُ بِأَحْكَمِ ٱلْحَٰكِمِينَ ﴿٨﴾

سُورَةُ العَلَق

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

ٱقْرَأْ بِٱسْمِ رَبِّكَ ٱلَّذِى خَلَقَ ﴿١﴾ خَلَقَ ٱلْإِنسَٰنَ مِنْ عَلَقٍ ﴿٢﴾ ٱقْرَأْ وَرَبُّكَ ٱلْأَكْرَمُ ﴿٣﴾ ٱلَّذِى عَلَّمَ بِٱلْقَلَمِ ﴿٤﴾ عَلَّمَ ٱلْإِنسَٰنَ مَا لَمْ يَعْلَمْ ﴿٥﴾ كَلَّآ إِنَّ ٱلْإِنسَٰنَ لَيَطْغَىٰٓ ﴿٦﴾ أَن رَّءَاهُ ٱسْتَغْنَىٰٓ ﴿٧﴾ إِنَّ إِلَىٰ رَبِّكَ ٱلرُّجْعَىٰٓ ﴿٨﴾ أَرَءَيْتَ ٱلَّذِى يَنْهَىٰ ﴿٩﴾ عَبْدًا إِذَا صَلَّىٰٓ ﴿١٠﴾ أَرَءَيْتَ إِن كَانَ عَلَى ٱلْهُدَىٰٓ ﴿١١﴾ أَوْ أَمَرَ بِٱلتَّقْوَىٰٓ ﴿١٢﴾ أَرَءَيْتَ إِن كَذَّبَ وَتَوَلَّىٰٓ ﴿١٣﴾ أَلَمْ يَعْلَم بِأَنَّ ٱللَّهَ يَرَىٰ ﴿١٤﴾ كَلَّا لَئِن لَّمْ يَنتَهِ لَنَسْفَعًۢا بِٱلنَّاصِيَةِ ﴿١٥﴾ نَاصِيَةٍ كَٰذِبَةٍ خَاطِئَةٍ ﴿١٦﴾ فَلْيَدْعُ نَادِيَهُۥ ﴿١٧﴾ سَنَدْعُ ٱلزَّبَانِيَةَ ﴿١٨﴾ كَلَّا لَا تُطِعْهُ وَٱسْجُدْ وَٱقْتَرِب ۩ ﴿١٩﴾



سوورەتی (التين)

بەناوی خوای بەخشندە و میهرەبان

(١) سوێند بە هەنجیرو زەیتوون (کە دوو میوەی بەسوودو بەکەڵکن، سوێند خواردنی خوا بە دروستکراوانی بۆ سەرنج راکێشانمانە، بەڵام سوێند خواردنی ئێمە گەورەیی و گرنگی سوێند پێ خوراوەکە دەگەیەنێت).
(٢) بەکێوی طوری سینا (کە خوا گفتوگۆی لەگەڵ حەزرەتی موسا، لەوێدا کرد).
(٣) سوێند بەم شارە ئەمینە، کە(مەککە)یە.
(٤) بەڕاستی ئێمە ئینسانمان لە جوانترین شێوە و ڕێکوپێکترین شێوازدا دروست کردووە لە هەموو ڕوویەکەوە.
(٥) (ئەگەر ڕێبازی خواناسی نەگرێت) سەرەنجام دەیخەینە نزمترینی شوێنە نزمەکانەوە (لە دۆزەخدا).
(٦) جگە لەوانەی کە باوەڕیان هێناوە و کارو کردەوە چاکەکانیان ئەنجامداوە، پاداشتی هەمیشە و نەبڕاوە بۆیان ئامادەیە.
(٧) جا ئیتر (ئەی ئینسانی سەرکەش) چی وای لێکردوویت باوەڕت بە ڕۆژی قیامەت و لێپرسینەوە نەبێت دوای ئەو هەموو نازو نیعمەتە؟
(٨) ئایا خوا چاکترین فەرمانڕەوا نیە؟ دادپەروەرترین فەرمانڕەوا نیە؟ (کەچی تۆی سەرکەش پێی ڕازیی نیت!!).

سورەتی (العلق)

بەناوی خوای بەخشندە و میهرەبان

(١) (ئەی محمد ﷺ) بخوێنە بەناوی ئەو پەروەردگارەتەوە کە هەموو شتێکی دروست کردووە.(٢) ئادەمیزادی لە چەند خانەیەکی هەڵواسراو (لەناو منداڵداندا) دروست کردووە.(٣) بخوێنە، لەکاتێکدا هەر پەروەردگاری تۆ بەخشندەیە.
(٤) ئەو زاتەیە کە بەهۆی قەڵەمەوە زانستی و زانیاری فێر کردووە.(٥) ئادەمیزادی فێری ئەو شتانە کردووە کە نەیزانیوون.(٦) نەخێر (لەگەڵ ئەو هەموو چاکە و ڕێزەدا کە خوا بەخشیویەتی بە ئینسان) بەڕاستی خەڵکی سەرکەشی دەکەن، یاخی دەبن، ستەم دەکەن.(٧) لەبەر ئەوەی هەر ئادەمیزاد هەستی کرد دەوڵەمەند و بێنیازە (لە ڕووی ئابووری، یان تەندروستی، یان زانستی...هتد)یەوە.(٨) (ئەوە فەرامۆش دەکات کە): بێگومان سەرەنجام گەڕانەوە هەر بۆ لای پەروەردگارتە و (لەسەرکەش و یاخیەکان دەپرسێتەوە).(٩) باشە، پێم بڵێ ئایا ئەو کەسەی کە فەرمان دەدات و ڕێگری دەکات؟!...(١٠) لە بەندەیەکی خوا کاتێک نوێژ دەکات!!...
(١١) ئەی ئەگەر ئەو کەسەی قەدەغەی لێدەکرێت لەسەر ڕێبازی هیدایەت و چاکە بێت!!
١٢) یان فەرمان بە خواناسی بکات!!....(١٣) ئەی ئەگەر (کابرای خوانەناس) بەرنامەی خوا بەدرۆ بزانێت و پشتی تێبکات.(١٤) ئایا نەیزانیوە کە خوا دەیبینێت و ئاگای (لە گوفتار و کرداریەتی)؟!
(١٥) نەخێر.. سوێند بەخوا ئەگەر کۆڵ نەدات و کۆتایی (بە دوژمنکاری نەهێنێت)، ئێمە پێشە سەری دەگرین (بۆ دۆزەخ کێشی دەکەین).(١٦) ئەو پێشە سەرە درۆزنە تاوانکارە(پێشە سەر: جێگەی بیر کردنەوە و تێفکرانە).
(١٧) ئینجا وازی لێبهێنە، با هاوەڵ و هاوبیرو باوەڕانی بانگ بکات و (کۆیان بکاتەوە بۆ دژایەتی ئیمانداران).
(١٨) ئێمەش فریشتەکانی کاربەدەستی دۆزەخی بۆ بانگ دەکەین (تا تۆڵەی لێبسێنن و لە دۆزەخ توندی بکەن).
(١٩) نەخێر بەگوێی ئەو جۆرە کەسانە مەکە، تۆ هەر سەرگەرمی نوێژو سوژدە ببە و بە بەندایەتی خۆت لە پەروەردگارت نزیک بکەرەوە.



سوورەتی (القـــدر)

بەناوی خوای بەخشندە و میهرەبان

(١) ئێمـە بەراسـتی قورئانمـان دابەزاندۆتـە خوارەوە لە شەوێکی بەفەرو ڕێزداردا.

(٢) جا تۆ چووزانی شەوی بەفەرِ کامەیە و چ خێر و بەرەکەتێکە.

(٣) شەوی قەدری بەڕێز لە هەزار مـانگ ڕێـزدارو خێردارترە (واتە پاداشتی عیبادەت و خواپەرستی ئەو شەوە بێسنوورە).

(٤) لەو شـەوەدا فریشـتەکان کـە جوبرەئیلیشیان لەگەڵدایە، دادەبەزن لەسەر رووخسـەت و مۆڵـەتی پەروەردگاریان، بەجۆرەها فرمان و کار (بەتایبەت بۆ سەردانی خواپەرستان، بۆسەردانی مزگەوتەکان، بۆ گوێگرتن لە قورئان و...هتد).

(٥) ئەو شەوە ئاسـوودەیی و ئاشتی و هێمنی و رەحمەت و میهرەبانیە، هەتا کاتی بەرەبەیان.

پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (من قام ليلة القـــدر إيمانا واحتسابا غفر له ما تقدم من ذنبه).

واتە: ئـەوەی شـەوی قـەدر بەخواپەرستی و یـادی خوا بباتـە سـەر بـە ئیمـان و بـاوەڕی دامـەزراو و بەتەمابوونی پاداشت و رەحمەت، خوای گەورە لـە هـەموو گوناهـانی رابـووردووی خـۆش دەبێـت. (بوخاری و موسلیم) ریوایەتیان کردووە.

سوورەتی (البينـــة)

بەناوی خوای بەخشندە و میهرەبان

(١) ئەوانەی بێباوەڕ بوون لە خاوەنی کتێبەکان لەگەڵ موشریک و هاوەڵگەران، وازیـان لـە بیروبـاوەڕی خۆیـان نـەهێنا، هەتا بەڵگە و نیشانەی روون و ئاشکرایان بۆ نەهات (دەربارەی دواهەمین پێغەمبەر).

(٢) (ئەویش) پێغەمبەرێکە لەلایەن خواوە کتێب و نامەی پاک و بێگەردیان بەسەردا دەخوێنێتەوە (کە قورئانە).

(٣) چەندەها پەیامی پڕ لە رێنموویی بە نرخی لە توێدا هەیە.

(٤) جا خاوەن کتێبەکان دەستە دەستە و پارچە پارچە نەبوون، دوای ئـەوە نـەبێت کـە بەڵگـە و نیشـانەی ئاشکرایان بـۆ هات (دەربارەی پێغەمبەر و قورئان).

(٥) فەرمانیشیان پێنەدرا بوو جگە بەوەی کە خواپەرستی بکەن و بەپاکی و دڵسۆزی و ملکـەچی فـەرمانبـەرداری ئاین و بەرنامەکە بن و لابدەن لە هەموو ئایینێک و تـەنها پابەنـدی ئـایینی ئیسلام بـن، نوێژیـش بـەرێک و پێکـی ئـەنجام بدەن، زەکاتیش لە ماڵ و سامانیان دەربکەن، ئەوەیە ئاینی نامە راست و بەنرخەکانی خوا.

(٦) بەڕاستی ئەوانەی بێ باوەڕ بوون لە خاوەن کتێبەکان و موشریک و هاوەڵگەران دەخرێنە ناو ئـاگری دۆزەخـەوە و بـە نەمری تیایدا بۆ هەمیشە دەمێننەوە، هەر ئەوانەن تاوانبارترین و خراپترینی خەڵکانی سەرزەوی.

(٧) بێگومان ئەوانـەی ئیمـان و باوەڕیـان هێنـاوە و کـارو کـردەوە چاکـەکانیان ئـەنجامداوە، هـەر ئەوانـەن چاکـترین و پاکترینی خەڵکانی سەر زەوی.

جَزَآؤُهُمْ عِندَ رَبِّهِمْ جَنَّٰتُ عَدْنٍ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَآ أَبَدًا رَّضِىَ ٱللَّهُ عَنْهُمْ وَرَضُوا۟ عَنْهُ ذَٰلِكَ لِمَنْ خَشِىَ رَبَّهُۥ ﴿٨﴾

سُورَةُ الزَّلزَلَة

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

إِذَا زُلْزِلَتِ ٱلْأَرْضُ زِلْزَالَهَا ﴿١﴾ وَأَخْرَجَتِ ٱلْأَرْضُ أَثْقَالَهَا ﴿٢﴾ وَقَالَ ٱلْإِنسَٰنُ مَا لَهَا ﴿٣﴾ يَوْمَئِذٍ تُحَدِّثُ أَخْبَارَهَا ﴿٤﴾ بِأَنَّ رَبَّكَ أَوْحَىٰ لَهَا ﴿٥﴾ يَوْمَئِذٍ يَصْدُرُ ٱلنَّاسُ أَشْتَاتًا لِّيُرَوْا۟ أَعْمَٰلَهُمْ ﴿٦﴾ فَمَن يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ خَيْرًا يَرَهُۥ ﴿٧﴾ وَمَن يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ شَرًّا يَرَهُۥ ﴿٨﴾

سُورَةُ العَادِيَات

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

وَٱلْعَٰدِيَٰتِ ضَبْحًا ﴿١﴾ فَٱلْمُورِيَٰتِ قَدْحًا ﴿٢﴾ فَٱلْمُغِيرَٰتِ صُبْحًا ﴿٣﴾ فَأَثَرْنَ بِهِۦ نَقْعًا ﴿٤﴾ فَوَسَطْنَ بِهِۦ جَمْعًا ﴿٥﴾ إِنَّ ٱلْإِنسَٰنَ لِرَبِّهِۦ لَكَنُودٌ ﴿٦﴾ وَإِنَّهُۥ عَلَىٰ ذَٰلِكَ لَشَهِيدٌ ﴿٧﴾ وَإِنَّهُۥ لِحُبِّ ٱلْخَيْرِ لَشَدِيدٌ ﴿٨﴾ ۞ أَفَلَا يَعْلَمُ إِذَا بُعْثِرَ مَا فِى ٱلْقُبُورِ ﴿٩﴾



(٨) پاداشتیان لای پەروەردگاریان بەهەشتی پڕ لە باخی چڕە (کە کۆشک و تەلارەکان تیایدا ون بوون)، چەندەها رووباریش بەژێردرەخت و بەبەردەم کۆشکەکانیدا دەڕوات و لەوێ ژیانی هەمیشەیی و بەردەوام بۆ هەتاهەتایی دەبەنە سەر، ئەوانە خوا رازیە لێیان، ئەوانیش لەو رازین (چۆن رازی نابن ئەی پەروەردگاری ئازیز، بەڕاستی نازانین بە چ زمانێک سوپاسگوزارت بین) بێگومان ئەو رێزو قەدرە بۆ ئەو کەسەیە کە لە پەروەردگاری ترساوە و فەرمانەکانی بەجێ هێناوە.

(اللهم ارزقنا من خشیتك ما تحول بە بیننا و بین معصیتك) یا أرحم الراحمین.

سوورەتی (الزلزلة)

بەناوی خوای بەخشندە و میهرەبان

(١) کاتێک زەوی دەهێنرێتە لەرزە و بوومەلەرزە زۆر بەهێزەکەی بۆ پێشهات.

(٢) هەرچی لە زەویدا هەبوو لە ماددە سەنگینەکانی ناوی دەری پەڕاندو هێنایە دەرەوە.

(٣) (ئەوکاتە) ئادەمیزادیش دەڵێت: ئەوە چیەتی، بۆ وای لێهات (ئیماندار هەست دەکات کۆتایی دنیایە و بەرپابوونی رۆژی قیامەتە، بێ ئیمانیش سەری لێدەشێوێت و نازانێت بەرەو کوێ رابکات).

(٤) لەو رۆژەدا زەوی هەواڵەکانی خۆی دەگێڕێتەوە...

(٥) بەهۆی ئەوەی کە پەروەردگارت رایگەیاندووە (ئەی ئینسان) فەرمانی بۆ دەرکردووە (کاتی کۆتایی هاتنیەتی).

(٦) ئەو رۆژە خەڵکی دەستە دەستە بەرەو گۆڕەپانی لێپرسینەوە دەردەچن، بەپەرش و بڵاوی، تا کارو کردەوەکانیان ببیننەوە (دیارە کە نامەی کردەوەکان تۆمارکراوە بە دەنگ و رەنگەوە).

(٧) جا ئەوەی بەقەدەر سەنگی گەردیلەیەک خێرو چاکەی ئەنجام دابێت دەیبینێتەوە.

(٨) ئەوەش کە بەقەدەر سەنگی گەردیلەیەک شەڕو خراپەی هەبێت، دەیبینێتەوە.

سوورەتی (العادیات)

بەناوی خوای بەخشندە و میهرەبان

(١) سوێند بەو هۆکارانەی کە تیژڕەون و نرکە و ناڵەیان لێوە دێت.

(٢) بەو هۆکارانەی کاتێک کە ئاگر دەکەنەوە و بزیسکە دەدەن.

(٣) بەو هۆکارانەی کە لە بەرەبەیاندا هێرش دەبەنە سەر (ئۆردووی دوژمنان).

(٤) ئینجا دەبنە هۆی بەرپاکردنی تەپ و تۆزو گەردەلوول.

(٥) لەو کاتەدا خۆیان دەکەن بەناو جەرگەی دوژمناندا.

(٦) سوێند بەوانە هەمووی، بەڕاستی ئادەمیزاد لە ئاستی پەروەردگاریدا زۆر ناسوپاس و حەق نەناسە.

(٧) خۆیشی شایەتە لەسەر ئەو حاڵەی خۆی، (رۆژی قیامەت دان بە کەمتەرخەمی خۆیدا دەنێت).

(٨) بێگومان ئادەمیزاد لەخۆشەویستی ساماندا زۆر بەتین و هەڵپەیە (کە دەستی لێی گیربوو رەزیل و رژد و چرووکە).

(٩) ئایا ئەو جۆرە کەسانە نازانن چی پێش دێت کاتێک لە گۆڕەکان هێنرانە دەرەوە و (زیندوو کرانەوە)؟!

وَحُصِّلَ مَا فِي ٱلصُّدُورِ ﴿١٠﴾ إِنَّ رَبَّهُم بِهِمْ يَوْمَئِذٍ لَّخَبِيرٌۢ ﴿١١﴾

سُورَةُ القَارِعَةِ

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

ٱلْقَارِعَةُ ﴿١﴾ مَا ٱلْقَارِعَةُ ﴿٢﴾ وَمَآ أَدْرَىٰكَ مَا ٱلْقَارِعَةُ ﴿٣﴾ يَوْمَ يَكُونُ ٱلنَّاسُ كَٱلْفَرَاشِ ٱلْمَبْثُوثِ ﴿٤﴾ وَتَكُونُ ٱلْجِبَالُ كَٱلْعِهْنِ ٱلْمَنفُوشِ ﴿٥﴾ فَأَمَّا مَن ثَقُلَتْ مَوَٰزِينُهُۥ ﴿٦﴾ فَهُوَ فِي عِيشَةٍ رَّاضِيَةٍ ﴿٧﴾ وَأَمَّا مَنْ خَفَّتْ مَوَٰزِينُهُۥ ﴿٨﴾ فَأُمُّهُۥ هَاوِيَةٌ ﴿٩﴾ وَمَآ أَدْرَىٰكَ مَا هِيَهْ ﴿١٠﴾ نَارٌ حَامِيَةٌۢ ﴿١١﴾

سُورَةُ التَّكَاثُرِ

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

أَلْهَىٰكُمُ ٱلتَّكَاثُرُ ﴿١﴾ حَتَّىٰ زُرْتُمُ ٱلْمَقَابِرَ ﴿٢﴾ كَلَّا سَوْفَ تَعْلَمُونَ ﴿٣﴾ ثُمَّ كَلَّا سَوْفَ تَعْلَمُونَ ﴿٤﴾ كَلَّا لَوْ تَعْلَمُونَ عِلْمَ ٱلْيَقِينِ ﴿٥﴾ لَتَرَوُنَّ ٱلْجَحِيمَ ﴿٦﴾ ثُمَّ لَتَرَوُنَّهَا عَيْنَ ٱلْيَقِينِ ﴿٧﴾ ثُمَّ لَتُسْـَٔلُنَّ يَوْمَئِذٍ عَنِ ٱلنَّعِيمِ ﴿٨﴾

(١٠) هەرچیش لە سینەکاندا هەیە هەموی لە (کارنامەکاندا) بە تۆمار کراوی ئاشکرا کران و خرانە بەردەست!!

(١١) بەڕاستی پەروەردگاریان لەو ڕۆژەدا ئاگادارو شارازایە پێیان (بەوردی دەپرسێتەوە).

سوورەتی (القارعة)

بەناوی خوای بەخشندە ومیهرەبان

(١) (یەکێکە لە ناوەکانی ڕۆژی قیامەت) واتە: ئەو گرمەیەیی دڵان دەلەرزێنێت.

(٢) ئاخۆ ـ القارعە ـ چی بێت؟

(٣) (تۆ ئەی ئینسان) چی فێری کردویت کە ـ القارعە ـ چیە!!

(٤) ئەو ڕۆژە خەڵکی وەکو پەپولەی سەرگەردان پەرش و بڵاو دەبنەوە.

(٥) کێوەکانیش وەکو خوری شیکراوەیان لێ دێت (سووک دەبن و چاڵ و چۆڵیان پێ پڕ دەکرێتەوە).

(٦) جا ئەوەی تەرازووی خێری سەنگین بێت.

(٧) ئەوە لە بارودۆخێکی خۆش و ئاسوودەدا ژیان دەباتە سەرو زۆر پێی ڕازیە.

(٨) ئەوەش تەرازووی (خێرو چاکەی) سووک بێت (گوناهی زۆر بێت).

(٩) ئەوە دایکی ئەو دۆزەخە (باوەشی بۆ کردۆتەوە)

(١٠) جا تۆ چووزانی (هاویە) چیە؟!

(١١) ئاگرێکی زۆر سوتێنەرو بڵێسەدارە (هەرگیز خامۆش نابێت و تینی کەم ناکات و لەکوڵێ نابێتەوە).

سوورەتی (التکاثر)

بەناوی خوای بەخشندە و میهرەبان

(١) (خەڵکینە!!) هەڵپەکردن و پێشبڕکێتان بۆ زۆرکردنی (ماڵ و منداڵ و سامان و کۆشک و تەلار و..هتد) ئێوەی سەرگەرم و سەرگەردان و بێ ئاگا کردووە لە خواناسی و دینداری.

(٢) تا ئەو کاتەی کە دەمرن و دەبرێنە گۆڕستان (دەخرێنە ناو گۆڕێکی تەنگ و تەسک و تاریکەوە).

(٣) واز بهێنن، لەمەودوا دەزانن (چ قوڕێکتان بۆ خۆتان گرتۆتەوە، چ بەڵایەکتان بەسەر خۆتان هێناوە).

(٤) دیسانەوە دەڵێم: واز بهێنن.

(٥) واز بهێنن، ئەگەر ئێوە دەتانزانی، بەزانین و دڵنیایەکی تەواوەوە (وا بێ ئاگا نەدەبوون لە خواناسی).

(٦) سوێند بەخوا بێگومان دۆزەخ دەبینن (دۆزەخێکی تۆقێنەرو پڕ لە ئازار و ناسۆرە).

(٧) دووبارە سوێند بەخوا دۆزەخ بەچاوی سەرتان دەیبینن بە ئاشکراو دڵنیا دەبن (کە چەندە سامناکە).

(٨) پاشان سوێند بەخوا لەو ڕۆژەدا پرسیارتان لێ دەکرێت دەربارەی هەموو نازو نیعمەتەکانی دنیا (چۆنتان پەیدا کردووە و لە چیدا بەکارتان هێناوە).

سورة العصر

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

وَالْعَصْرِ ﴿١﴾ إِنَّ الْإِنسَانَ لَفِي خُسْرٍ ﴿٢﴾ إِلَّا الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ وَتَوَاصَوْا بِالْحَقِّ وَتَوَاصَوْا بِالصَّبْرِ ﴿٣﴾

سورة الهمزة

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

وَيْلٌ لِّكُلِّ هُمَزَةٍ لُّمَزَةٍ ﴿١﴾ الَّذِي جَمَعَ مَالًا وَعَدَّدَهُ ﴿٢﴾ يَحْسَبُ أَنَّ مَالَهُ أَخْلَدَهُ ﴿٣﴾ كَلَّا لَيُنبَذَنَّ فِي الْحُطَمَةِ ﴿٤﴾ وَمَا أَدْرَاكَ مَا الْحُطَمَةُ ﴿٥﴾ نَارُ اللَّهِ الْمُوقَدَةُ ﴿٦﴾ الَّتِي تَطَّلِعُ عَلَى الْأَفْئِدَةِ ﴿٧﴾ إِنَّهَا عَلَيْهِم مُّؤْصَدَةٌ ﴿٨﴾ فِي عَمَدٍ مُّمَدَّدَةٍ ﴿٩﴾

سورة الفيل

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

أَلَمْ تَرَ كَيْفَ فَعَلَ رَبُّكَ بِأَصْحَابِ الْفِيلِ ﴿١﴾ أَلَمْ يَجْعَلْ كَيْدَهُمْ فِي تَضْلِيلٍ ﴿٢﴾ وَأَرْسَلَ عَلَيْهِمْ طَيْرًا أَبَابِيلَ ﴿٣﴾ تَرْمِيهِم بِحِجَارَةٍ مِّن سِجِّيلٍ ﴿٤﴾ فَجَعَلَهُمْ كَعَصْفٍ مَّأْكُولٍ ﴿٥﴾

## سوورەتی (العصـــر)

بەناوی خوای بەخشندە و میهرەبان

(١) سوێند بە زەمانە، سوێند بەکاتی عەسر.

(٢) بەڕاستی ئادەمیزاد لە زەرەرمەندی و خەسارەتمەندیدایە.

(٣) بێجگە لەوانەی کە باوەڕیان هێناوە و کارو کردەوە چاکەکانیان ئەنجامداوە و ئامۆژگاری یەکتریشیان کردووە کە هەمیشە پابەندی حەق بن (پابەندی حەقیش پێویستی بەخۆگری هەیە)، لەبەر ئەوە بەردەوام ئامۆژگاری یەکتریان کردووە تا هەمیشە و بەردەوام، خۆگرو ئارامگریش بن.

## سوورەتی (الهمـــزة)

بەناوی خوای بەخشندە و میهرەبان

(١) هاوارو ئاهو ناڵە بۆ هەر کەسێک کە بە شوێن کەم و کووڕیدا دەگەڕێت و لە عەیب و عاری خەڵکی دەدوێت.

(٢) ئەو کەسەی ماڵ و سامانی زۆری کۆ کردۆتەوە و هەر خەریکی ژماردنێتی و (دڵی پێی خۆشە، ڕەزیلە و بەخشندە نیە).

(٣) وادەزانێت بەراستی کە ماڵ و سامانەکەی دەبێتە هۆی تەمەن درێژی و نەمریی بۆی؟

(٤) نەخێر سوێند بەخوا بە سووکی و ریسوایی فڕێ دەدرێتە ناو (حطمة) وە.

(٥) جا تۆ چووزانی (حطمة) چیە؟

(٦) بریتی‌یە لە ئاگری داگیرساو و بڵێسەداری خوا.

(٧) ئەو ئاگرەی ڕوو دەکاتە ناو جەرگەی دڵ و دەروونەکان (کە مەڵبەندی کوفرو خوانەناسی و ڕەزیلی یە).

(٨) بێگومان ئەو ئاگرو دۆزەخە لە شوێنێکدایە کە سەرگیراوو دەرگا داخراوە لەسەریان (ڕێگەی قوتار بوونی نیە).

(٩) (خوانەناسان لەوێ) لەناو چەند ستوونێکی ئاگرینی درێژدان (هیچ جم و جوڵێکیان بۆ ناکرێت).

## سوورەتی (الفیـــل)

بەناوی خوای بەخشندە و میهرەبان

(١) ئایا نەتزانیووە (ئەی پێغەمبەر ﷺ) پەروەردگارت چی کرد بەخاوەن فیلەکان؟!

(٢) ئایا سەری لێ نەشێواندن و پیلان و نەخشەکانیانی پووچ نەکردەوە؟!

(٣) پۆل پۆل باڵندەی نەناردە سەریان؟!

(٤) تا بەبەردی سەنگگڵ (وەک خشتی سوورەوە کراو)، بەرد بارانیان بکەن.

(٥) سەرەنجام وەکو پووش و پەڵاش و کای خوراوی لێکردن، (درێژەی ئەم بەسەرهاتە لە { ژیان نامەی پێغەمبەری مەزندا} لە نووسینی مامۆستا عبدالعزیز پارەزانی دا تەماشا بکە).

سُورَةُ قُرَيْشٍ

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

لِإِيلَافِ قُرَيْشٍ ١ إِيلَافِهِمْ رِحْلَةَ الشِّتَاءِ وَالصَّيْفِ ٢ فَلْيَعْبُدُوا رَبَّ هَٰذَا الْبَيْتِ ٣ الَّذِي أَطْعَمَهُم مِّن جُوعٍ وَآمَنَهُم مِّنْ خَوْفٍ ٤

سُورَةُ الْمَاعُونِ

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

أَرَأَيْتَ الَّذِي يُكَذِّبُ بِالدِّينِ ١ فَذَٰلِكَ الَّذِي يَدُعُّ الْيَتِيمَ ٢ وَلَا يَحُضُّ عَلَىٰ طَعَامِ الْمِسْكِينِ ٣ فَوَيْلٌ لِّلْمُصَلِّينَ ٤ الَّذِينَ هُمْ عَن صَلَاتِهِمْ سَاهُونَ ٥ الَّذِينَ هُمْ يُرَاءُونَ ٦ وَيَمْنَعُونَ الْمَاعُونَ ٧

سُورَةُ الْكَوْثَرِ

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

إِنَّا أَعْطَيْنَاكَ الْكَوْثَرَ ١ فَصَلِّ لِرَبِّكَ وَانْحَرْ ٢ إِنَّ شَانِئَكَ هُوَ الْأَبْتَرُ ٣

سوورەتی (قریش)

بەناوی خوای بەخشندە و میهرەبان

(١) لەبەرئەوەی قورەیش هۆگر بووە و...

(٢) خوی گرتووە بەکاروانی زستانەی (یەمەن)و کاروانی هاوینەی (شام) بۆ بازرگانی و (دابین کردنی بژێوی).

(٣) کەواتە با پەروەردگار و خاوەنی ئەمماڵە پیرۆزە (کەعبە) بپەرستن.

(٤) ئەوزاتەی لەبرسێتی رزگاری کردن وخۆراکی پێبەخشین و لە ترس و بیمی (جەردە و رێگران) پاراستوونی و ئاسایشی بۆ دابین کردوون.

سوورەتی (الماعون)

بەناوی خوای بەخشندە و میهرەبان

(١) ئایا سەرنجت نەداوە لەو کەسەی ئاینی خوا بەدرۆ دەزانێت؟!

(٢) کەوابوو ئەو جۆرە کەسە ئەوەیە کە پاڵ بە هەتیوەوە دەنێت و پیایدا هەڵدەشاخێت.

(٣) هانی کەسیش نادات تا خواردن و خۆراک ببەخشێت بە هەژارو نەداران.

(٤) جا هاوار و واوەیلا بۆ نوێژگەرانێک...

(٥) ئەو نوێژگەرانەی گوێ نادەن بەنوێژەکانیان و کارکردی نیە لەسەریان و دڵی نادەنێ و لێی غافڵن ...

(٦) ئەوانەی کە ریابازن و بە رووکەش نوێژ دەکەن و دەیانەوێت خۆیان دەربخەن و (ئیمانداران بخەڵەتێنن).

(٧) (هەمیشەش هەوڵ دەدەن بۆ) قەدەغە کردنی هەموو چاکە و یارمەتی و کۆمەکی و هاوکاریەک.

سورەتی (الكوثر)

بەناوی خوای بەخشندە و میهرەبان

(١) بەڕاستی ئێمە خێرو چاکە و خۆشی (هەردوو جیهان و ناوبانگی چاکەی) تۆمان (ئەی محمد ﷺ) بێ ئەندازە و بێ سنوور کردووە (لە هەموو چەرخ و زەمانێکدا).

(٢) کەواتە نوێژ تەنها لەبەر خواو بۆ خواو بۆ بەدەستهێنانی رەزامەندی پەروەردگارت ئەنجام بدە و قوربانییش بکە (هەر بەو شێوەیە بۆ بەدەستهێنانی رەزامەندی پەروەردگارت).

(٣) بێگومان هەر دوژمنان و ناحەزانی تۆ بێ ناو و نیشان و وەجاخ کوێرو دوابڕاون (لە هەموو خێرو چاکەیەک لە هەردوو جیهاندا).

سُورَةُ الكَافِرُونَ

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

قُلْ يَا أَيُّهَا الْكَافِرُونَ ﴿١﴾ لَا أَعْبُدُ مَا تَعْبُدُونَ ﴿٢﴾ وَلَا أَنتُمْ عَابِدُونَ مَا أَعْبُدُ ﴿٣﴾ وَلَا أَنَا عَابِدٌ مَّا عَبَدتُّمْ ﴿٤﴾ وَلَا أَنتُمْ عَابِدُونَ مَا أَعْبُدُ ﴿٥﴾ لَكُمْ دِينُكُمْ وَلِيَ دِينِ ﴿٦﴾

سُورَةُ النَّصْرِ

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

إِذَا جَاءَ نَصْرُ اللَّهِ وَالْفَتْحُ ﴿١﴾ وَرَأَيْتَ النَّاسَ يَدْخُلُونَ فِي دِينِ اللَّهِ أَفْوَاجًا ﴿٢﴾ فَسَبِّحْ بِحَمْدِ رَبِّكَ وَاسْتَغْفِرْهُ ۚ إِنَّهُ كَانَ تَوَّابًا ﴿٣﴾

سُورَةُ المَسَدِ

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

تَبَّتْ يَدَا أَبِي لَهَبٍ وَتَبَّ ﴿١﴾ مَا أَغْنَىٰ عَنْهُ مَالُهُ وَمَا كَسَبَ ﴿٢﴾ سَيَصْلَىٰ نَارًا ذَاتَ لَهَبٍ ﴿٣﴾ وَامْرَأَتُهُ حَمَّالَةَ الْحَطَبِ ﴿٤﴾ فِي جِيدِهَا حَبْلٌ مِّن مَّسَدٍ ﴿٥﴾

سوورەتی (الكافـــرون)

بەناوی خوای بەخشندە و میهرەبان

(١) (ئەی محمد ﷺ) بڵێ: ئەی کۆمەڵی بێباوەڕو خوانەناسان.

(٢) من هەرگیز ئەو شتانەی کە ئێوە دەیپەرستن نایپەرستم (چونکە من خواپەرستم).

(٣) ئێوەش دیارە ئـەوەی مـن دەیپەرستم نایپەرستن (چونکە بت پەرستن).

(٤) ئـەوەی ئێوە پەرستووتانە مـن هیـچ کـات نایپەرستم.

(٥) ئێوەش، ئەو زاتەی من دەیپەرستم نایپەرستن.

(٦) (کەواتە) دینی خۆتان بۆ خۆتان و دینی خۆم بۆ خۆم.

(ئەم سوورەتە کاتێک هاتە خوارەوە، بێباوەڕان ویستیان ڕێک بکەون لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ کە ئەو ماوەیەک بتەکانی ئەوان بپەرستێت ئەوانیش هەمان ماوە خوای ئەو بپەرستن!!).

سوورەتی (النصـــر)

بەناوی خوای بەخشندە و میهرەبان

(١) کاتێک یارمەتی و کۆمەکی خوا دێت، شـاری مەککە رزگـار دەکرێـت و دەرگـای ئـازادی والآ دەکرێت.

(٢) خەڵکیشت بینی پۆل پۆل دەچنە ریزی ئـاینی خواوە.

(٣) ئەوسا ئیتر تۆ سوپاس و ستایشـی پـەروەردگارت بکـە و داوای لێخۆشبوونی لێ بکـە، چونکـە بەڕاسـتی خـوا زۆر چاوپۆشی دەکات و تەوبە وەرگرە.. (ئومێدە لەئایندەیەکی نزیکدا، خوای بالادەست سەرکەوتنێک ببەخشێت، ئـەو کاتە ئیمانداران هەست دەکەن ئەم سوورەتە تازە دابەزیووە).

سوورەتی (المســـد)

بەناوی خوای بەخشندە و میهرەبان

(١) دەستەکانی بشکێت ئەبولەهەب و ریسوا ببێت، ئاشکرایە کە هەر ریسوایش دەبێت و (لەناودەچێت).

(٢) ماڵ و دارایی و ئەو شتانەی کە بەدەستی هێناوە، فریای نەکەوت.

(٣) لەئاییندەدا دەخرێتە ناو ئاگرێکی بڵێسەدارەوە.

(٤) هەروەها ژنەکەشی کە هەمیشە هەڵگری کۆڵەدارە و (ئازاری پێغەمبەر ﷺ دەدات).

(٥) هەمیشە گوریسێکی چنراو لە پووشی خورما لە گەردنیایەتی (لە قیامەتیشدا زنجیری ئاسن دەکرێتە گەردنی).

(کاتێک پێغەمبەر ﷺ تیرەو تایەفەکانی کۆکردەوە و پەیامی خوای پێراگەیاندن ئەبولەهەب وتی: (تبا لك ألهـذا دعوتنــا) ئیتر ئەم سوورەتە هاتە خوارەوە، کە هێرشێکی بەردەوامە بۆ سەر ئەبولەهەب و هاوسەرەکەی و ئەوانەی لەوان دەچن).

سُورَةُ الإخلاص

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

قُلْ هُوَ اللَّهُ أَحَدٌ ﴿١﴾ اللَّهُ الصَّمَدُ ﴿٢﴾ لَمْ يَلِدْ وَلَمْ يُولَدْ ﴿٣﴾ وَلَمْ يَكُن لَّهُ كُفُوًا أَحَدٌ ﴿٤﴾

سُورَةُ الفلق

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ الْفَلَقِ ﴿١﴾ مِن شَرِّ مَا خَلَقَ ﴿٢﴾ وَمِن شَرِّ غَاسِقٍ إِذَا وَقَبَ ﴿٣﴾ وَمِن شَرِّ النَّفَّاثَاتِ فِي الْعُقَدِ ﴿٤﴾ وَمِن شَرِّ حَاسِدٍ إِذَا حَسَدَ ﴿٥﴾

سُورَةُ الناس

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ النَّاسِ ﴿١﴾ مَلِكِ النَّاسِ ﴿٢﴾ إِلَٰهِ النَّاسِ ﴿٣﴾ مِن شَرِّ الْوَسْوَاسِ الْخَنَّاسِ ﴿٤﴾ الَّذِي يُوَسْوِسُ فِي صُدُورِ النَّاسِ ﴿٥﴾ مِنَ الْجِنَّةِ وَالنَّاسِ ﴿٦﴾

سوورەتی (الإخــلاص)

بەناوی خوای بەخشندە و میهرەبان

(١) (ئەی محمد ﷺ، ئەی ئیماندار) بڵێ: ئەو خوایەی کە ناوی - الله - یە خوایەکی تاکو تەنهایە (بێ هاوەڵ و هاوتایە).

(٢) خوا زاتێکی پایەدارو دەسەڵاتدارە، نیازی بە کەس نیە و هەمووان ئاتاجی ئەون، هەر ئەو دەتوانێت بەڵاو ناخۆشی لابەرێت و پێویستی و داخوازیەکانمان جێبەجێ بکات.

(٣) هیچ کەسی لێ نەبووە و خۆیشی لە کەس نەبووە.

(٤) هەرگیز هاوتا و هاوشێوە و دەسەڵاتدارێکی تر نیە کە لە بەرامبەریەوە بوەستێت و هاوشانی بێت.

سوورەتی (الفلــق)

بەناوی خوای بەخشندە و میهرەبان

(١) (ئەی محمد ﷺ، ئەی ئیماندار) بڵێ: پەنا دەگرم بەو پەروەردگارەی کە بەرەبەیان پێش دەهێنێت.

(٢) لە شەڕو خراپەی هەرچی کە دروستی کردووە (لە پەری و ئادەمیزاد و مارو مێروو..).

(٣) لەشەڕو خراپەی شەو کاتێک کە دادێت و دنیا تاریک دەبێت و دەبێت بە شەوەزەنگ.

(٤) لە شەڕو خراپەی ئەو کەسانەی کە جادوو دەکەن و پەت و دەزوو گرێ دەدەن و فووی پیادەکەن (بە فێڵ و جادوو نێوان خەڵکی تێک دەدەن).

(٥) لە شەڕو خراپەی حەسوود و بەخیل، کاتێک کە حەسوودی و بەخیلی دەبات.

سوورەتی (النـــاس)

بەناوی خوای بەخشندە و میهرەبان

(١) (ئەی محمد ﷺ، ئەی ئیماندار) بڵێ: پەنادەگرم بە پەروەردگاری خەڵکی.

(٢) بەپادشای خەڵکی.

(٣) بەخوای خەڵکی.

(٤) لە شەڕو خراپەی ئەوەی کە وەسوەسە و خەتەرە و خەیاڵ دەخاتە دڵەوە کە (خەنناسە).

(٥) بریتی‌یە لەوەی کە وەسوەسە فڕێ دەداتە سینە و دڵ و دەروونی خەڵکیەوە.

(٦) لە پەری و خەڵکی، لە جنۆکە و ئادەمیزاد (ئەوانەیان کە شەیتان سیفەتن).